# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک



## کەرکوک لە مێژوودا

سەرپەرشتیاری گشتی نووسین و پێداچوونەوە
سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

بەرگی دووەم






بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیریی
جەمال عیرفان ٢٠٢٣
زنجیرە: (١٣٩)

بەڕێوەبەری دەزگا:
سیروان حەمەسەعید حەمەخورشید

**ناوی کتێب: ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك- بەرگی دووەم: کەرکوك لە مێژوودا**
**نووسینی: کۆمەڵێك نووسەر**
**سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە: سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)**
**سەرپەرشتیاری زانستی و ئەکادیمی: د. یوسف گۆران**
**سەرپەشتیاری کارگێڕی: زاهیر شکور**
**دیزاینی ناوەوە: ئەنجام سەعید**
**دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی**
**تایپ: زەینەب حەمید**
**نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢٣**
**تیراژ: ٥٠٠ دانە**
**چاپ: چاپخانەی تاران**

**لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارە سپاردنی**
**(٢٠٠٧)ی ساڵی ٢٠٢٠ پێ دراوە**

Tel: 0533202936 07736959302
email: jamalerfan99@gmail.com
jamal erfan cultural foundation
www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی سالم، بەرامبەر قەیوان تاوەر

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک

## بەرگی دووەم



## کەرکوک لە مێژوودا

### بەشداران

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد
د. کۆزاد محەمەد ئەحمەد
د. کەیوان ئازاد ئەنوەر
د. بەختیار سەعید مەحمود
د. زرار سدیق ئاڕوجەیی
د. قادر محەمەد حەسەن
د. نووری تاڵەبانی
د. عیماد عەبدولسەلام
د. ڕافیدە عەبدوڵڵا قەرەداغی
د. عوسمان عەلی
د. پشکۆ حەمە تاهیر
ئاریان جەمال هەرزانی
فەرید ئەسەسەرد
محەمەد شاکەلی
مستەفا ئەریمان
وەستا ڕەسوڵ
ستران عەبدوڵڵا
جەلال جەوهەر
خالید شوانی
مەسعود عەبدولخالق
لیام ئاندرسن
جەمال سەعید
بەختیار محەمەد ئەمین
سەرتیپ محەمەد جەبار
کاوە محەمەد (خەیام)
محەمەد باقی سەعید مستەفا
مەریوان ئیبراهیم عەبدوڵڵا

د. کامەران کوێخا جەلال
د. حوسێن یوسف حازم
د. دڵشاد عومەر عەبدولعەزیز
د. دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان
د. ئەجمەدین کەریم
د. یوسف گۆران
کەمال نووری مەعرووف
موعتەسەم ئەجمەدین
مستەفا عەسکەری
ئاکۆ خالید ئەحمەد
حەسەن بارام
قارەمان نادر شێخ بزێنی
ئاراس عەبدولڕەحمان
مەلا شاخی
شەوکەوتی حاجی موشیر
عارف قوربانی
عەبدولحەکیم خەسرەو جوزەل
بەیار عومەر عەبدوڵڵا
ئەسیری
حەمە زیاد مەولود
جۆست هیلتەرمان
موزەفەر ساڵح قادر
ئارام ڕەزا عیزەددین
بەهرۆز ساڵح حەسەن
سمکۆ بەهرۆز
وەسفی حەسەن
مۆفەق میراودەلی
حوسێن عەونی

٢٠٢٣

# * کەرکوك لەسەردەمەکانی پێش مێژوودا :-

ناوچەی کەرکوك وەکو گەلێك ناوچەی تر نییە کە شوێنی نەبێت لە سەرهەڵدانی ڕووداوەکانی پێش مێژوو، بەپێچەوانەوە بناغەیەکی پرشنگداری ڕووداوەکانی پێش مێژووە، شوێنێکی بەر چاوی هەیە چ لەسەر ئاستی کوردستان چ لەسەر ئاستی جیهان لە بووژانەوەی لانکەی مرۆڤایەتیو خاوەنی یەکەم گوندی کشتوکاڵییە کە تێدا بوژانەوەی مێژوویی ناوچەکەی پێوە دیارە.

دەتوانین ڕووداوەکانی پێش مێژوو بەم شێوەیەی خوارەوە دابەش بکەین:-

*** سەردەمی چاخی بەردینی کۆن:**

کە ئەم سەردەمەی بەردینەش دابەش دەکرێتە سەر سێ چاخی بەردینی کە بریتییە لە بەردینی کۆنی ژێرەوە، بەردینی کۆنی ناوەراست، بەردینی کۆنی سەرەوە. ئەوەی لەم چاخەدا سەرنج ڕادەکێشێت لە ناوچەی کەرکوك بوونی ئەم سەردەمە هەیە بەڕوونی، بەڵام بەشێوەیەکی ساکارو سادەو زانیارییەکان زۆر بەکەمو بێ بەڵگەن. کۆنترین ناوچەیەکی سەردەمی بەردینی کۆنی ژێرەوە کە تا ئێستا دۆزرابێتەوە ناوچەی بەردە بەڵکەیە..کە سەردەمی نیشتەجێبوون لەم ناوچەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بەفرینی دواوە لەنێوان (٠٠٠، ١٠٠- ٠٠٠، ٦٠) ساڵی کەڕۆییەوە.. شوێن بەردە بەڵکە[١] دەکەوێتە ماوەی مۆستیدییەوە هەرچەندە کە چەند ئامرازو کەرەستەیەکی ئەشولی ئەم دواییەی لێدۆزراوەتەوە، بەڵام سەردەمی بەردینی کۆنی ناوەراست تەنها لە ناوچەی هەزارمێرد دۆزراوەتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مۆستیدی کە ناوچەیەکی هاوسنووری لەنێوان سلێمانی – کەرکوك، بەڵام سەردەمی بەردینی کۆنی سەرەوە لە ئەشکەوتی پاڵە گەورە دۆزراوەتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە.

*** سەردمی بەردینی ناوەراست:-**

ئەم سەردەمە لە دوایی کۆتایی سەردەمی بەردینی کۆن دێت کە ناوەندە لەنێوان سەردەمی بەردینی کۆنو سەردەمی بەردینی نوێ دا کە دەناسرێت بەووردی کەرەستەکانیانو بەکارهێنانی هەندێك کەرەستەی کشتوکاڵی وەکو داسو هاوەناتو دەستاری گەنم کە لەوانەیە هەستابێتن بە کشتوکاڵی تاقیکردنەوە بەشێوەیەکی سنووردار، بەڵام بەڵگەی تەواو نییە بۆ کاری کشتوکاڵی کە لەوانەیە ئەم کەرەستانە بۆ دروێنەی گژوگیای ئەو دەشتە بەکار هاتبێت، بەهۆی تاقیگەی (کاربۆنی ١٤)وە ئەم سەردەمە دەگەڕێتەوە بۆ (١٢٨٠٠) ساڵی ڕۆیشتوو. پاشماوەکانی بەشێوەیەکی ڕوون لە ناوچەی کەریم شایەر دۆزراوەتەوە[٢].

*** سەردەمی بەردینی نوێ:-**

وا دادەنرێت چەرمو کۆنترین شارستانیەتی ئەم سەردەمە بێت کە جێگای سەرهەڵدانی یەکەم گوندی کشتوکاڵییە... چونکە گونجاندنی ئاوو هەوای ناوچەکە وای کردووە کە ببێتە هۆی سەرهەڵدانی شارستانی لەم ناوچەیەداو بەدەوروبەریدا بڵاوبێتەوە...

(تاقیگەی (کاربۆنی ١٤) مێژووی ئەم گوندەی بە نزیکەی (٨٨٣٠+ ٢٠٠) رابردوو، یان لە تاقیگەیەکی تردا (١١٢٤٠+ ٢٤٠) ساڵی رابردووی بۆ داناوە)[٣].

هەروەها نموونەی ئەم سەردەمە لە (حەسوونە)ی نێوان (کەرکوك – موسڵ)و گردی (قەرەتیاغ) نزیك دێی مەتارە دۆزراوەتەوە بەدووری ٣٤ کیلۆ مەتر لە خوارووی شاری کەرکوکەوە، کە بەپێی تاقیگەی کاربۆنی ١٤ دەکەوێتە نزیکەی (٧٥٧٠+ ٢٥٠) ساڵی رابردوو. کە لێکچوونێکی خوارووی ئەوەی کە دۆزراوەتەوە لە حەسوونەدا هەیە[٤].

*** سەردەمی بەردینی "کانزایی – میتالی:-**

کە ئەمیش گۆرانکارییەکی پێشکەوتووی سەردەمی بەردینی نوێیە چ لە ڕووی جۆری گڵکاریو بەکارهێنانی شێوەی هونەری نەخشو نیگارو هونەری بیناکاریدا، کە گۆرانێکی بنەرەتی دروست کرد کە لەگەڵ سەردەمەکانی تردا تایبەتمەندی پێوە دیارەو هەست دەکرێت بەهەوڵدانی ئەو گۆرانکارییە لە هەمە جۆری بەکارهێناندا.

دەتوانین نموونەی ئەم سەردەمە لەگەڵێك شوێنی ناوچەی کەرکووکدا بدۆزینەوە، کە لە سەردەمی (حەلەف) دا لە ناوچەکانی گردی سەوانو مەتارەو نوزیو حەسوونە هەبووە.

لە سەردەمی شارستانی عوبێد دا لە ناوچەکانی مەتارەو نوزیو لە ناوچەی حەمرین هەبوو، کە دەگەڕێتەوە نزیکەی (٦٠٧٠+ ١٦٠) ساڵی رابردوو بەپێی کاربۆنی ١٤[٥].

دەتوانین بڵێین کە سەردەمی بەردینی کانزایی بەردەوامییەکی هەمە چەشنی شارستانی هەمان سەردەمی هەیە لە ناوچەی کەرکووکداو زنجیرەیەکی دانەبراو بووە هەر لە شارستانی حەلەفو حەسوونەوە تا شارستانی عوبێد.

بۆ زیاتر شارەزایی لەسەردەمە مێژووییەکانی پێش مێژوو بڕوانە خشتەی ژمارە (١)

**خشتەی ژمارە (١) سەردەمە بەردینەکانی ناوچەی کەرکووك.**

| ز | ناوچەکان | مێژووی سەردەمەکان | سەردەمە بەردینەکان |
|---|---|---|---|
| ١ | بەردە بەڵکە | ٦٠٠٠٠٠پێش زایین | سەردەمی بەردینی کۆنی ژێرەوە |
| ٢ | هەزار مێرد | ٠٠٠، ١٢٠ پێش زایین | سەردەمی بەردینی کۆنی ناوەڕاست |
| ٣ | پاڵە گەورە | ٠٠٠، ٣٥٠ پێش زایین | سەردەمی بەردینی کۆنی سەرەوە |
| ٤ | کەریم شایەر | ٠٠٠، ١٠ پێش زایین | سەردەمی بەردینی ناوەڕاست |
| ٥ | چەرموو- حەسوونە | ٧٠٠٠ پێش زایین | سەردەمی بەردینی نوێ |
| ٦ | حەسوونە- مەتارە- نووزی - قادش گەورە قادش بچووك | ٥٠٠٠ پێش زایین | سەردەمی بەردینی کانزایی |

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:-**

**١- العراق في التاريخ - ادوار عصور ماقبل التأريخ في العراق، نووسینی کۆمەڵێك مێژوونووس، بەغدا، ساڵی ١٩٨٣، ل ٤٩ -٥٠.**

**٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١.**

**٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٢.**

**٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٣ -٥٦.**

**٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٧ - ٦٠.**

*** تیرۆژە تیشکێك بۆ سەر شوێنەواری بەردە بەڵکە:-**

**کەمال نوری مەعروف**

بەردە بەڵکە یەکێکە لەو شوێنەوارانەی کە زانایانی شوێنەوارو خاکناسی لە ناوەڕاستی ئەم چاخەوە زۆر هاتوونەتە دیدەنیی و زانیارییان لەسەر پاشماوەکانی وەرگرتووەو کنەو پشکنینان تیا کردووە، وای بۆچوون کە کۆنترین شوێنەوارە لە کوردستانی باشوور هەتاکو ئێستاکە دەرکەوتبێت. لەگەڵ هەموو ئەو راو بۆچوونانەشدا پاشماوە دەرکەوتووەکانی شوێنەوارەکە بە تەواوی لێی نەکۆڵدراوەتەوە ئەمەش بە ئاشکرا بە سەرچاوە مێژووییەکانەوە دیارە.

بۆ ناسین و دەستنیشانکردنی پاشماوەکانی بەردەبەڵکەو سەردەمەکەی و ئەو بارودۆخەی تیا دەرکەوتووە زیاتر پێویستمان بە بەراوردکردنی پاشماوەکانی هەیە لەگەڵ پاشماوە شوێنەوارییەکانی تر بۆ ئەوەی بگەینە ئەنجامێك کە ئایا سەردەمی بەردە بەڵکە کۆنترە لەوەی کە ئێستا بۆی دیاری کراوە هەر وەکو هەندێك لە پسپۆران بۆی دەچن یان سەردەمەکەی لە چاخی مستێری تێپەڕناکات هەروەکو هەندێك لە شارەزایان وای بۆ دەچن[١]

بەردە بەڵکە دەکەوێتە سەر تەپۆڵکەیەك لە دووری (٣) کیلۆ مەتر لە باکووری خۆرهەڵاتی چەمچەماڵ لە پارێزگای سلێمانی هەروەها دەکەوێتە دووری (٢٠٠)مەتر لە باشووری خۆرهەڵاتی رێگای کەرکوك – سلێمانی. لەسەر لێژاییەکی رۆخی لقێکی کورتی چەمی شیوە سوورە کە بەرەو باشووری خۆرهەڵاتی دەشتی چەمچەماڵ بۆ باسەرە دەروات لەوێشەوە پێچ دەخواتەوە رووەو باشووری خۆرئاوا تا دەگاتەوە بە (تاوق چای)[٢].

بەردە بەڵکە[٣] بەشێکە لە بەردێکی گەچی شێوە ناتەواوی پێکهاتووی نزیك لوولەیی ئەگەر لاکانیی و بەشی خوارەوەی نەخورایە. درێژییەکەی (٤) مەترەو تیرەکەی لە پانترین شوێن. هەر چوار مەترەو تیرەکەی لە بەشی خوارەوەیدا ٢/٢٠ مەترە.

دکتۆر (ناجی الاصیل) رای وایە کە ئەو بەردە لەسەر سەکۆیەکی بەردین دانراوەکە، کەوتووەتە ژێر تەپۆڵکەکە[٤]، بەڵام کنەو پشکنین لە شوێنەوارەکەدا ئەو باوەڕەی دایە دواوە چونکە ئەو ئەنجامەی بە دەستەوە نەدا تەپۆڵکەی شوێنەوارەکە پێکهاتووە لە چینێکی نیشتووی گەچی چاخی پلاستۆسین کە نیشتووەتە سەر تاوێرە بەردینەکانی چاخی مایۆسین. ئەستووری ئەو نیشتووانەش لەنێوان (١٠-١٥) مەترە[٥].

تەپۆڵکەی شوێنەوارەکە رووەو خۆرهەڵات و باشوور دەست بە بەرزبوونەوە دەکات کە بە دوو لوتکەی دی کۆتاییان دێ. لوتکەی خۆرهەڵات کە کەمێك لە بەردەکە دوورە، کۆمەڵێك بەردی قەوارە مام ناوەندی تیا دەبینرێت کە چەقیونەتە ناو زەوییەکەو بازنەیەکی شێوە نارێکیان دروست کردووەکە تیرەکەی (٦) مەترەو دانیشتووانی ناوچەکە دەڵێن شوێنەواری قەڵایەکی کۆنە[٦].

دکتۆر (ناجي الاصیل) بەڕێوەبەری گشتی ئاسەواری کۆن لە کاتی گەشتەکەیدا بۆ ناوچەی چەمچەماڵ ساڵی (١٩٤٩) شوێنەواری بەردە بەڵکەی دۆزیوەتەوە کە ژمارەیەکی زۆر ئامێری بەردین و بەردە ئەستێی تێدا دیوەتەوە کە بۆ مەودایەکی دوور بەسەر ناوچەکەدا بڵاو بوونەتەوە. سەرئەنجام توانییە وەسفێکی تەواوی شوێنەوارەکە بکاو دەسنیشانی سەردەمی دروسکراوە بەردینەکانی بکات هەروەها نیشانی داوە کە بەردە بەڵکە کۆنترین شوێنەوارە کە تا ئێستا لە کوردستاندا دەرکەوتوە[٧].

لەکاتی کنەو پشکنینی خاکناسی و شوێنەواری دەشتی چەمچەماڵ کە پەیوەندی بە کنەو پشکنینی خاکناسیی و شوێنەواری دەشتی چەمچەماڵ واتە قەڵا چەرمووو کەریم شایەرەوە هەبووە کە پەیمانگای خۆرهەڵاتی سەر بە دانیشگای شیکاگۆو قوتابخانە ئەمریکییەکان ساڵی (١٩٥١) بە سەرۆکایەتی رۆبەرت. جەی. برەیدوود[٨] ئەنجامیان داوە. دووان لە ئەندامانی دەزگای کنەو پشکنینەکە (رایت)و (هاو) لە کنەو پشکنینی شوێنەواری بەردە بەڵکە کۆڵیونەتەوەو بۆیان دەرکەوتووە کە ئەنجامدانی کاری کنەو پشکنین لە هەندێ شوێنی شوێنەوارەکەدا پەیوەندییە گرنگەکانی سەردەمە خاکناسییەکانی ناوچەکە لەگەڵ کەلتووری چاخی بەردینی کۆن کە لە پاچە کۆڵە دەستییەکان و ئامێرەکانی تردا دەبینرێنەوە نیشان دەدا. گرنگی پێدان بەو شوێنەوارە لەو نامەیەدا دەرئەکەوێت کە، (برەیدوود) لە (١٠ی مارتی ساڵی ١٩٥١) ناردوویە بۆ ناجی بەگ کە تێیدا هاتووە: دوێنێ (رایت)و (هاو)[١٠] سەردانی (بەردە بەڵکە) یان کرد، (رایت) سەردانەکەی دوا خست هەتا (هاو) گەیشت.

هەردووکیان بۆ ماوەی دوو هەفتە زۆرینەی کاتیان لەسەر کەناری رووبارو شوێنەوارەکانی تر کە پەیوەندی دارن بەسەر دەبەن. (رایت) دوێنێ شەوکاتێك گەڕایەوە زۆر بە پەرۆش بوو، بۆ بارودۆخەکەی (بەردە بەڵکە)و تواناکانی لایەنە ( geochronological). (رایت)و (هاو) هەستیان بەوە کرد کە هەلێکی ناوازەیان دەسکەوتووە بۆ جێگیرکردنی دروستکراوەکانی چاخی بەردینی کۆن لە چینە خاکناسییە سەرەکییەکاندا ئەگەر بتوانرێ ئامێرەکان لە شوێنە سەرەکییەکانی ناو ئەم چینانەدا رەچاو بکرێن. لە بەشێکی تری نامەکەدا دەڵێ: (رایت) پێی راگەیاندم کە ژمارەیەکی کەم چاڵی گچکە لە خەیاڵیدا هەیە هەڵیان بکەنێت کە لە مەترێك قوڵتر دەبن، ئیشەکەش پێویستی بە (١٠) پیاو دەبێت بۆ ماوەی (٥) رۆژ. من وا هەست دەکەم قسە بۆ ئەم چاڵانە بۆ وەدەسخستنی زانیاری کرۆنۆلۆجییە، کە (رایت) پێشبینی دەکات. هەروەها دەڵێ: داواکارم ئەم نامەیە بە داوای رەسمی دابنرێت ئەگەر ئێوە کاری رێپێدانەکە جێ بەجێ بکەن کە دڵنیام رازی دەبن، ئەمەش کارێکی سەرنج راکێش دەبێ بۆ تۆ و بۆ ئێمە[١١].

کاتێك داوای کنەو پشکنینەکەی شوێنەواری (بەردە بەڵکە) خراوەتە بەردەم دکتۆر (ناجی الاصیل) ئەویش

رازی بووە[١٢] ئەمەش دڵخۆشییەکی گەورەی خستووەتە ناو ئەندامانی نێردراوەکە. ئەمەش لەو نووسراوەدا دەردەکەوێ کە بەڕێوەبەرێتی گشتیی ئاسەواری کۆن لە بەغدا بە ژمارە ٥٠١/٧٣٣/٣٨ لە ١٩٥١/٣/١٨ ناردوویە بۆ بەڕێز سەبری شوکری نوێنەری بەڕێوەبەرێتییە کە لای نێردراوی ئەمریکی لە قەڵای چەرموو کە تیایدا هاتووە:

دکتۆر برەید وود پێشنیار دەکات لە جیاتی ئێمەو ئێوە هەردوو دکتۆر هەربرت رایتو برۆس هاو لێکۆڵینەوەیەك لەسەر بەردە بەڵکە ئەنجام بدەن وە زەوییەکەی هەڵکەندنی تیا بکەن کە دەڵێن کارەکە چوار ڕۆژی دەوێ. ئێمەش رەزامەندیمان نیشان داوە بە مەرجی ئەو کنەو پشکنینە بە ناوی بەڕێوەبەرێتییەکەمانەوە ئەنجام بدرێو هەموو ئەو سەر ئەنجامە زانستییانەش دەیگەنێ لە گۆڤاری سۆمەردا بڵاو بکرێتەوە. بروسکەیەکیشمان لەو ڕووەوە بۆ ناردووی کە لەگەڵ ئەم نووسراوە دایە. تکایە بیخوێنەرەوەو بە پێی ئەوەی لە بروسکەکەدا هاتووە نوێنەرایەتی بەڕێوەبەرێتییەکەمان لە کارەکانی پشکنینەکەدا بکا لە قەڵا چەرمودا. لە (١٥ی مارتی ١٩٥١) (هەربەرت رایت)[١٣].

(برۆس هاو لەگەڵ ١٠کرێکار سەرقاڵی هەڵکەندنی (٣) چاڵ بوون لە بەشی باشوورو باشووری خۆرئاوای شوێنەوارەکەدا درێژی یەکەمیان کە چاڵێکی پچڕ پچڕ بووە پەنجا یاردەو قوڵییەکەی ١-٢ یاردەو پانییەکەی یاردەیەك، بەڵام دوو چاڵەکەی تر گچکەتر بوون. جگە لەوانەش دوو چاڵی گچکەی تریش لە چوار دەوری (بەردە بەڵکە)[١٤] هەڵکەندراون. سەرەنجام هەردوو تۆژیارەکە گەیشتوونەتە ئەوەی شوێنەوارەکە پێکهاتووە لە چینێکی شارستانی کە، دەکەوێتە ژێر چینێکی قوڕو لیتەوە چەو بە ئەستوری (٥) پێ. لە ئەنجامی کنەو پشکنینەکەدا ئامێری دروسکراوی بەردین دۆزرایەوە، کە توێژێکی نیشتووی گەچی سەوزییان بە سەرەوەیەو مەیلەو سوور دەڕوانێ بەڵام چینە چەوییەکە زۆر بەهێز یەکیان گرتووەو بوونەتە پارچەیەکی بە هێزی یەگکرتوو. جگە لەوانەش چەند چینێکی زەوی دۆزرانەوە کە ڕەنگیان جیاواز بوو، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە ئێسقانی بەردیوە لەگەڵ بەردو بەردە ئەستی[١٥].

لەبەر تیشکی هەموو ئەو پاشماوانە هەردوو تۆژیار گەیشتنە.

١- لە ڕاستیدا بەردە بەڵکە پاشماوەیەکی سروشتی بەرگرییە کە هۆکارەکانی ئاوو هەواکاری تێنەکردووە.

٢- ئەو ئامێرانەی کە لەسەر ڕووی شوێنەوارەکە بە شێوەیەکی بەربڵاو دۆزرانەوە لە پێشەوە لە ورگی ئەو چینە چەوەدا بوون کە دواتر لەسەر ڕووی شوێنەوارەکە دەرکەوتوون یان جارێکی تر دابەشبوونەتەوە لە ئەنجامی هۆکارەکانی ئاوو هەوا لە سەردەمەکانی دواتردا.

٣- ئەو چینە چەوەی کە لەناو جۆگاو شوێنە نیشتووەکاندا دروست بووەو بووەتە توێژاڵی پێکهاتەی ڕووی دەشتە خوراوەکەی چەمچەماڵ کە دۆڵو شیوی گەورە لەناو ئەو نیشتووانەدا هەڵکەنراون. هەروەها لەو چینە بەردینەی ژێری کە ئەستورییەکەی لەنێوان (٢٠- ٥٠) مەترە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەڵکەندنو لەتبوون لە جۆگەلە بچکۆڵەکەی (بەردە بەڵکە)دا قوڵییەکەی دەگاتە (١٠- ١٥) مەتر.

ئەو پەیوەندییانە ئاماژەیە، کە شوێنەوارەکە لە ڕووی خاکناسیی و ئاسەوارییەوە گەورەیە بە تایبەتی لەو کاتەی کە ئامێرەکان لەو چینە چەوەی خوارەوەدا بەرەو ڕووی خاکەکە هاتوونەتە دەرێ ئەمەش بەهۆی کارتێکردنی ئاوو هەواوە بووە کە کاری کردووەتە سەر ڕووی جۆگاکان، کە پێکهاتووە لە چینێکی قوڕو لیتەکە جۆگەلەو چاڵو چۆڵی قووڵی تێدا پەیدا بووە ئەمەش بە هۆی تۆڕی دۆڵو شیوەکانە کە بۆ سەردەمێکی تازەتر دەگەڕێنەوە.

ئاسۆی دانیشتن لەم چینە شارستانییەدا زۆر کۆنترە لەوەی (کەریم شایەر)و (قەڵا چەرموو). ئەو دوو شوێنەوارەی دوایی لەژێر چینی قوڕو لیتەی نزیك ڕووی زەوییە خوراوەکە دۆزراونەتەوە کە لەوانەیە دوای پارچە بوون یان لە تبوونی ڕووی زەوییە لیتەییەکە درووست بووبن. پاشماوەی ئامێرە بەردینەکانی ئەم چینە شارستانییەی (بەردە بەڵکە) کراوە بە (٣) جۆرەوە:

١- پاچەکۆڵە دەستییەکان
٢- ئامێرە چەوینەکان
٣- ئامێرە ئەستێییەکان.

ئامێرە چەوینەکان کە هەموویان لە جۆری بەردی گەچن پێکهاتوون لە ئامێری دروستکراوی چەوی ناو ڕووبار، خڕ، یان هێلکەیی کە ڕێگای دروستکردنی وردە وردە بە لێکردنەوەی دوو توێخ یان زیاتر لە ناوەڕاستەکەی یان بە لێکردنەوەی هەردوو ڕووی لایەکانی.

لە یەکەم جاردا وا دەرئەکەوێت کە ئامێرە چەوینەکان جوانکرابن، بەڵام سەیرکردنیان بە وردی دەری ئەخەن ئەو ئامێرانەی کە لە بەردی گەچ دروستکراون تەنیا بەو شێوەیەن.

جگە لەوەش دیاردەی تلبونەوەی ئامێرەکان بەهۆی کارتێکردنی شەپۆڵەکانەوە نەبووە بەڵکو بە هۆی زیاتر خواردووە کیمیاییەکانەوە بووە کە، کەوتوونەتە ژێر کارتێکردنییەوە ئەمەش لەو کاتەوەی کە بووە بە ژێر چینی چەوەکەوە بووەتە هۆی ئەوەی کە ڕووی ئامێرەکان بخورێت. ئەوانەی کە بەو شێوەیەن بە تایبەتی ڕووەکانیان کە چاڵو چۆڵی وردی تیا دروست بووە بەهۆی ئەو کارتێکردنەوە.

ئەو ئامێرە بەردە ئەستی وردانەی کە زۆرینەی پیشەسازی (بەردە بەڵکە)ی پێك هێناوە چەند جۆرێکی جیاوازن لەوانە (رنە)ی ساکار کە لە پارچەی بەردە ئەستی دروستکراوەو لەسەر لێوارێکی یان زیاتر نیشانەی بەکارهێنان یان جوانکردنی پێوە دیار نییە. بەڵام ناوك چەند شێوەیەکی هەیە لەوانە خڕ، یان چەند ڕوو کە زۆر لەمانە قەوارە مام ناوەندی یان گچکەن.

پاچە کۆڵە دەستییەکان هەندێکیان لە تەڵەزمی گەورە دروستکراون تیایاندا هەیە واتە کەمێکیان جوان دروستکراون بەڵام زۆرینەیان خراپو سانا دروستکراون. سەرەتاکەی لە شێوەی دڵدا، یان لە بزینەییا هاتوونەتەوە کە لەنێوانیاندا ژمارەیەکی کەم، جۆری (Micoguian)ی درێژە.

هەندێك لەوانە لە سەرەکەیدا، یان یەکێك لە ڕووەکانیدا

تویکلی چەوەکەی پێوە دیارە. هەموو ئەو ئامێرە دروستکراوانە وا دەرئەکەون هاوتەمەن بن. هەندێك لەوانە تێکەڵی چینەکە بوون، کە پاشماوەی رێککردنیان پێوەیە. هەر دوو توێژیار رایان وایە: هەموو ئەو پارچە بەردە ئەستێیانە کە دروستکراون هەروەها ژمارەی زۆر لە پارچە، یان تەڵەمزی ناوك کە لە چینە چەوەکەدا دەبینرێن نیشانەی ئەوەن کە شوێنەوارەکە کارگەیەك بووبێت بۆ دروستکردنی ئەو ئامێرانە[١٦].

جگە لە ئامێرو بەردە ئەستێ کۆمەڵێکی بە نرخ پاشماوەی ئاژەڵ دەرهێنراون کە لەگەڵ ئەوەشدا زۆرینەیان پارچەی ووردبوون.

لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکانی (فەردریك بارپ)ی (٨) مۆزەخانەی رەگەزناسی سەر بە دانیشگای ئۆسلۆ ئەم پێناسە گشتییەی خـوارەوەی لەسەر داوە ئەمەش لەو نامەیەدا دەرئەکەوێ کە، (رۆبەرت، جەی، برەیدوود) بۆ دکتۆر (کینیپ ئۆکلی) لە ٢٠ی مارتی ساڵی (١٩٥١) ناردووە تێیدا دەڵێ: پاشماوەیەکی بچوکی ئاژەڵی هەیە، کە، (بارپ) ئەم پێناسە گشتییەی خوارەوەی لەسەر نووسیوە: ددانی سەرەتایی، پارچەی ددان لەگەڵ هەندێ پارچەی ئێسقان کە زۆرینەیان ددانی خرێن بە باشی هەڵگیراون لەگەڵ هەندێ ئێسقانی پەنجەی قاچو هەندێکی کەم لە پارچەی (Bos)ی گەورەو یەك پارچەی شاخ، جگە لە ژمارەیەکی کەم لە پارچەی قاوغی کیسەڵو ژمارەیەکی کەم لە توێکڵی هێلکە شەیتانۆکە[١٧].

لێکۆڵینەوە لەسەر پاشماوە ئاژەڵییەکانی (بەردە بەڵکە) هەر بەوەوە نەوەستاوە بەڵکو کەرەستە ئاژەڵییەکانی بوونەتە بابەتێك بۆ ناردنی نامەو وتوێژ لەنێوان سەرۆکی تیمی کنەو پشکنینەکەی چەرموو و ناوەندە زانستییو کەسانی ناسراوو شارەزا لەو بوارەدا. ئەمەش لەو نامەیەدا دەرئەکەوێ کە، (رۆبەرت، جەی، برەیدوود) ناردوویە بۆ دکتۆر (ناجی الاصیل) لە (٢٠ی مارتی ساڵی ١٩٥١) کە تێیدا هاتووە.

ئەم پێچراوەیە بریتییە لە نامەیەك بۆ دکتۆر (Kenneth OaKleh) لە مۆزەخانەی بەریتانیا (مێژووی سروشتی) کە ئێمە لە کاتی سەردانە باشەکەی تۆ بۆ ئێرە قسەمان لەسەر کرد.

لەو بڕوایەدام کە (ئۆکلی) باشترین کەسێت لەوێ هەر لەوێش لەسەر پاشماوە ئاژەڵییەکانی (بەردە بەڵکە) باشترین توێژینەوەمان دەست نەکەوێت. بێگومان ئێمە هیوای زۆرمان هەیە کە پاشماوە ئاژەڵییەکان ناسینەوەی زۆر ورد دەربارەی تەمەن بەدەستەوە ئەدەن چونکە ئەو زانیارییانەی کە لەو پاشماوە ئاژەڵییانەوە دەست دەکەون گەلێك گرنگترن لەوەی لە گۆرانکارییە خاکناسیەکانەوە دەست ئەکەون. هەروەها دەڵێ:

من پێشتر بۆ Oakley باسم کردبوو کە تۆ لە نامەکەی خۆتا لە بارەی ئەو کارسازییانەوە کە حەزی پێدەکەی بۆ ناردنی کەرەسەکان بۆ هەندەران بۆلێکۆڵینەوە لەسەریان بۆی روون دەکەوێتەوە[١٨].

لە نامەیەکی تردا کە Oakley بۆ بەرێوەبەری گشتیی ئاسەواری کۆن لە بەغدا لە (١١ی مایسی ساڵی ١٩٥١) ناردوویە لە بارەی پاشماوە ئاژەڵییەکانی (بەردە بەڵکە) لە بەشێکیدا هاتووە:

من پێشنیار دەکەم هاورێکەم دکتۆر (F.cFraser) کە سەر بە بەشی زانستی ئاژەڵە لەم مۆزەخانەیەدا باشترین کەسە بۆ رێگا نیشاندانو ئامۆژگاری کردنی تۆ دەربارەی پاشماوە ئاژەڵییەکانی شوێنەواری بەردە بەڵکە. ئەگەر نامەی بۆ بنێری، ئەتوانێ بڕی کەرەسەکان کە لە نامەکەدا داوا کراون بۆ تاقیکردنەوە روون بکرێنەوە[١٩].

بە دوای ئەو نامەیەدا لە (٧ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥١) دکتۆر (برەیدوود) نامەیەکی تری بۆ ناجی بەگ لەسەر پاشماوە ئاژەڵییەکانی بەردە بەڵکە نووسیوەو تێیدا هاتووە: ئێمە لە واتای نامەکانی تۆ دەربارەی بابەتەکە، کە بۆت ناردبووین خراپ تێگەیشتبووینو واحاڵی بووین کە ئێسقانەکان پێویستە لە لای دکتۆر (Jrazer)ەوە بروات بۆ لای دکتۆر (Oakley) بۆ تاقیکردنەوە ئەمەش بێگومان (بڕۆس هاو) لەگەڵ خۆی ئێسقانەکان دەبات بۆ دکتۆر (Oakley) بۆ پاریس ئەویش نیشانی پرۆفیسۆر (aroum berg)ی دەدات.

بە گوێرەی ئەو ئەنجامەی کە. منو (Oakley) بە دەستمان هێناوە من ئەمەوێ دووبارە دڵنیات بکەم کە هەموو پاشماوە ئاژەڵییەکان دوای توێژینەوە لە سەریان زوو بەزوو راستەخۆدەگەرێنرێنەوە بۆ بەرێوەبەرێتی گشتی ئاسەوار ئەمەش ماوەی ساڵێکی پێ دەچێت[٢٠].

لە (١٦ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٢) نامەیەك لە دکتۆر (F.c fraser)ەوە بۆ دکتۆر (برەیدوود) هاتووە تێیدا ناسنامەی پاشماوە ئاژەڵییەکانی بەردە بەڵکەی دیاری کردووە، سەرەتا دەڵێ: داوای لێ بووردنت لێ دەکەم بۆ ئەو دواکەوتنە دوورو درێژەی تاقیکردنەوەی نموونەکانی (بەردە بەڵکە). کۆکراوەکە لەو جۆرەیە کە من ناتوانم لە سەریان زۆر بڵێم ئەمەش پەیوەندی بە دۆخی شکانی کەرەسەکانەوە هەیە. ئێسقانی ئاژەڵە مەمکدارەکان ئەمانەن کە خراونەتەرو:

فیلی هیندستانی: ددانی بڕندەی دەرنەهاتووە

کەرکەدەن: یەك ددانی خرێنی خوارەوە.

ئەسپ: ژمارەیەکی زۆر ددانی بڕندەو خرێ.

گا: ژمارەیەکی زۆر ددانو پارچەی ددان.

بزنومەر: تاکە ددانێکی خوارەوە بەشی دواوە کە لە قەبارەیەکی بچوکدایەو هی یەکێکە لەو دوو ئاژەڵەی کە ناویان هاتووە.

مارپێچ: چوار قاوغی توێکڵ کە لایەن میستەر (wilkins) بەشی (Mollusca) پێناسە کراوە. دەربارەی پارچەی شاخ من ناتوانم را دەربڕم[٢١].

هەندێ بەراورکاری: هەتاکو ئێستا هیچ بەراورد کارییەك لەنێوان پاشماوەکانی چینی زەوی بەردە بەڵکە، کە مرۆڤی تیا ژیاوە لە سەردەمەکانی ئاشولیی و تاییسی و مۆستێری لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەراست لەگەڵ شوێنەوارە جیا جیاکانی تر نەکراوە بۆیە لێرەدا دەتوانین ئەو بەراورد کارییە لەنێوان کۆمەڵە ئامێرەکانی بەردە بەڵکەو شوێنەکانی تردا

بكەین، چونكە وەكو سەردەم لە یەكەوە نزیكن، هەروەها لەو باوەڕەداین كە ئەو شوێنەوارانە كەوتوونەتە سەر هێڵی هاتوچۆی مرۆڤ لەو سەردەمە زووەی كوردستاندا كە مرۆڤ دوای ئاژەڵ كەوتووە بۆ ڕاوكردنی بۆ ئەوەی بەردەوامی بە ژیانی بدات لە ئاوو هەوایەكدا كە باراناوی بووە.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا دەتوانین بڵێین لێكچوونێك لەنێوان پاشماوە بەردینەكانی بەردەبەڵكەو شوێنەوارە جیا جیاكانی تری كوردستانی باشوورو عێراق دەبینرێ هەروەكو لە پاشماوەكانی گوندی (رفان علیا)دا دەرئەكەوێ، كە دەكەوێتە باشووری ناحیەی (زەمار)ی خۆرئاوای حەوزی (سەدام) لە ناوچەی ئاسكی مووسڵ، كە پێكهاتووە لە پاچەكۆڵەی شێوە هەرمێیی و دەمەتیغو چەقۆو (رنە)، كە بۆ هەردوو پیشەسازی ئاشولیی و مستێری دەگەڕێنەوە[22].

سەرباری ئەوەش دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە ئامێرەكان لە هەندێ ڕووی ترەوە لە هەردوولادا جیاوازی دەكەوێتە نێوانیانەوە لەوانە پاچە كۆڵەكانی (بەردە بەڵكە) لەگەڵ ئەوەشدا كە هەندێكیان جوان دروستكراون بەڵام زۆرینەیان ساكارن بە بەراوردكردنیان لەگەڵ ئەوانەی ئاسكی مووسڵ دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە پاچە كۆڵەكانی بەردە بەڵكە كۆنترن، جگە لە ئامێرە جیاجیاكانی تر كە هاوشێوە دەوەستنەوە.

ئامێرە چەوەكان كە، لە (بەردە بەڵكە)دا بە زۆری دەبینرێن، لەناو پاشماوەكانی ئاسكی مووسڵ دا بەرچاو ناكەون. لێرەدا جارێكی تر دەتوانین هەمان بەراورد بكەین لەنێوان ئامێرەكانی بەردە بەڵكەو ئامێرەكانی تری خۆرهەڵاتی دیجلەی ڕۆخی شیوەكان كە لە باشووری ناحیەی فایدەی دهۆك دەچنەوە سەری، كە دیارترینیان لە هەردوولادا ئامێرەكانی برین و پارچەكۆڵەو رنەن لە پیشەسازی ئاشولی. لێرەدا جارێكی تر دەتوانین هەمان بەراورد لەگەڵ پاشماوەكانی دەورووبەری گوندی (كەرخوش)و گوندی (باپیرەكە)[23] ئەنجام بدەین كە ئێستا لە ژێر ئاو دان. لەوە دەچێت لە هەردوولادا ئامێرە ئەستێییەكان بۆسەردەمێك دەگەڕێنەوە كە چاخی مستێرییە. بەراوردێكی دیكەش لەنێوان پاشماوەكانی بەردە بەڵكەو پاشماوە جیا جیاكانی تری شوێنەوارەكانی شاخی (كەرمەل) لە ئەشكەوتی (تابون)و (سخول)و (وادی)[24].

لە سوریا، دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە ئامێرەكانی هەردوولا بە پاچە كۆڵەكانیشەوە نموونەی لە یەكچوونن، واتە كەلتورێكی لە یەكچوو كۆی كردوونەتەوە كە بۆ سەردەمی كۆچی مرۆڤ لە هێڵێكی هاتوچۆكردنی هاوبەشدا یەك دەگرێتەوە.

هەندێ ڕاو بۆچوون: پاشماوەی ئامێرە بەردینەكانی بەردە بەڵكە كۆنترین پاشماوەن كە هەتا، ئێستا لە كوردستانی باشوور لەناو چینێكی نیشتەجێ بوونی شارستانییا كە وەكو خۆیان ماونەتەوە دەركەوتوون. خۆشبەختانە دەتوانین مێژووی ئەو كۆمەڵە ئامێرانە لە ڕێگای پاشماوە ئاژەڵییەكانەوە دیاری بكەین كە هی چاخی سەهۆڵینی قۆرمن.

پاشماوەكانی بەردە بەڵكە لە ئامێری بەردین و ئێسقان سەرەتا لە ژێر چینێكی قوڕو لیتەدا دەركەوتوون كە لەناو چینێكی چەوی یەكگرتوودا بوون. ئەمانەش پاشماوەی ئەو كاتەن كە مرۆڤ شوێنەوارەكەی بەجێ هێشتووە.

لەوە ناچێت دانیشتن لە شوێنەواری بەردە بەڵكەدا لە دوو وەرز زیاتر لە ساڵێكدا بەردەوامیی هەبووبێت چونكە ئەو پاشماوە قوڕو لیتەیەی بەجێ ماوە بەڵگەی ئەوە نیشان دەدا كە، ناوچەیەكی باراناوی بووە، لە هەمان كاتیشدا هۆكارێك بووە وردە وردە بۆ جوڵاندنی ئامێرە بەردینەكان.

كۆنترینی ئەو ئامێرانە كە لە پاچە كۆڵە بەردینەكاندا دەبینرێنەوە هی قۆناغی پیشەسازی سەردەمی ئاشولی ناوەڕاستن كە، پاشماوە چەوەكەی پێوە دیارەو زۆرینەیان جوان دروستكراون كە جیاوازییان تیا دەبینرێ هەروەها هەندێكی تر لەو ئامێرانە هیچ جۆرە شارەزاییەك لە دروستكردنیاندا بەكار نەهاتووە، ئەمانەش دەخرێنە پاڵ پیشەسازی ئاشولی پەیڕەوكراو.

لەناو پاشماوە دەركەوتووكانی (بەردە بەڵكە)دا بەڵگەیەكی سەلمێنەرمان دەست نەكەوتووە كە مرۆڤ ئاگری بەكار هێنابێت، هەروەها لەناو بەردە ئەستێكانیشدا پارچە بوون یان سووربوونەوەیان پێوە دیار نییە كە نیشانەی ئاگر بێت، هەمان شت بە پاشماوە ئاژەڵییەكانیشەوە واتە ئێسقانەكانەوە پاشماوەی سووتاندن نییە. ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێت كە ئاگر لەو سەردەمە كۆنەی كوردستاندا نەبوە بەڵكو زانراو بووە.

بەپێی پاشماوە ئاژەڵییەكان پێی دەچێت (بەردە بەڵكە) شوێنەوارێكی ئاسایی بوبێت بۆ ژیانی مرۆڤ لە سەردەمی ئاشولی بە دواوە لەبەر ئەوەی پاشماوەكان ئاماژە بە ئاژەڵی گەورەو قەوارە مام ناوەندی دەدات هەروەكو فیلی هیندی و كەركەدەن و گاو ئەسپ و بزن و مەڕ.

گومانیشی تێدا نییە گۆڕانی ئاوو هەوا لە سەرماو گەرما كارتێكردنی گەورەی ڕاستەخۆی هەیە بۆ بەسەر ژیانی ڕووەك و ئاژەڵ كە بڵاو بوونەوەیان و نەمانیان پەیوەستە بە گونجاندنیان لەو ئاوو هەوا گۆڕاوەدا كە هەرێمەكەی گرتووەتەوە ئەمەش تێڕوانینێكە بۆ مرۆڤ كە لەو چاخە زووەدا گۆشتی بەكار هێناوە بۆ خواردنی ڕۆژانەی.

هەتاكو ئێستا هیچ زانیارییەكمان لە بارەی ڕووەكی (بەردە بەڵكە)وە نییە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هۆی دەرنەكەوتنی لەناو پاشماوەی كنەو پشكنینەكەدا بەڵام هیوادارین لە داهاتوودا ئەگەر كنەوپشكنینی تازە لەو شوێنەوارەدا لە پاشماوەی قوڕو لیتەكەیدا بكرێ ئەو جۆرە تۆوانە بدۆزرێنەوە.

ئەوەی لێرەدا پێویستە بوترێ ئەوەیە كە پاشماوەی ئەو كۆمەڵە ئاژەڵە ئەوە دەگەیەنێت كە ناوچەكە بە دارو درەخت داپۆشرا بێ و زەوییەكانیشی لەوەرگا بوبێت. هەروەها ڕێژەی ئاویشی تیا بەرز بووە كە تیایدا مرۆڤ بۆ ماوەیەكی دوورو درێژ لەگەڵ فیل و كەركەدەن ژیاوە لە ململانێدا.

سەرەنجام: لەبەر تیشكی هەموو ئەو زانیارییانەی سەرەوە گەیشتینە ئەو خاڵانەی خوارەوە:

١- لەوە دەچێت شارستانێتی ئاشولی بۆ یەكەم جار لە

ئەورووپادا دەرکەوتبێت، ودواتر گوێزرابێتەوە و لە ناوچەی بەردە بەڵکەدا دەرکەوتووە، لەوێشەوە بە هەموو ناوچەکانی خۆرهەڵاتی دەریای ناوەراستدا بڵاو بووەتەوە لەوانە بەشەکانی تری عێراقی کۆنیش دەگرێتەوە، ئەمەش بە هۆی کۆچی راوچییەکانی وەکو ئەوانەی بەردە بەڵکە بە ئەنجام گەیەنراوە. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو لێکچوونە گەورەیەی کە لە بەرسازیدا دەبینرێتەوە بە تایبەتی پاچەکۆڵە دەستییەکان. ئەم لێکچوونەش تۆژیارەکان وای بۆ دەچن کە هەموو ئەو ناوچەنە هاوشانی کۆچی جوگرافییە، کە لەوانەیە لە چاخەکانی پلاستۆسیندا زیاتر دەرکەوتوتر بوبێت وەك لە ئێستا.

٢- ئەو جیاوازییەی لە شێوەی هەندێ لە ئامێرە بەردینەکانی بەردە بەلکەدادەبینرێ، دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە ئامێرەکان زیاتر ناوچەیین و لاسایی کردنەوەی کەلتورێکی گوێزراوەی پێوە دیارە.

٣- پەیوەندییە خاکناسیی و ئاسەوارییەکان دەریان خست کە شوێنەواری بەردە بەڵکە سەردەمەکەی دوورتر دەروات لەو مێژووەی بۆی دیاری کراوە کە چاخی بەردینی کۆنە ئەمەش لە ئەنجامی ئەو بەراوردکارییە دەرکەوت لەگەل شوێنەوارە دوورەکانی تر.

## * سەرچاوە و پەراوێزەکان:-

١- لەوانە شوێنەوارناسی گەورە تەها باقر رای وایە کە پاشماوەکانی بەردە بەڵکە هی چاخی مستێری بەردینی کۆنی ناوەراست، یان هەندێکیان هی چاخی بەردینی خوارووبن، بروانە: تەها باقر. مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة الوجيز في تأريخ حضارة وادي الرافدين ج١ ط٢، ١٩٨٦ ص١٧٩.

٢- هربرت رايت. بروس هاو. سومر. الجزء الثاني ١٩٥١. المجلد السابع. ص ٢٠٧.

٣- بەردە بەڵکە: ناوێکی کوردییەوە بە بەردێك دەوترێ بە پێوە وەستابێت یان پشتی پێوە بدرێ. مامۆستا گیوی موکریانیش هەمان رای هەیەو دەڵێ بەڵکە یان بەلەکە بە مانای قەد دێ. بروانە تەها باقر وفؤاد سفر المرشد الى مواطن الاثار والحضارة. الرحلة الرابعة. بغداد - كركوك - السليمانية. ص١٤ هەروەها گیوی موکریانی. قاموس مهاباد گ١. اربیل ١٩٦١ ص ٨٤.

٤- الدكتور ناجي الاصيل جولة استطلاعية في مواطن الاثار في الالوية الشمالية. سومر الجزء الثاني. المجلد الخامس (١٩٤٩). ص ٣١٣.

٥- الدكتور فرح بصمة جي. العصور الحجرية في العراق على ضوء الاكتشافات الجديدة سومر. الجزء الثاني. المجلد الحادي عشر ١٩٥٥. ص٢٣.

٦- الدكتور ناجي الاصيل. جولة استطلاعية في مواطن الاثار في الالوية الشمالية. نفس المصدر السابق. ص٣١٣.

٧- الدكتور ناجي الاصيل. جولة استطلاعية في مواطن الاثار في الالوية الشمالية. نفس المصدر السابق ص ٣١٤.

٨- برەیدوود. رۆبەرت (١٩٠٧) بەناوبانگترین زانای پێش مێژووی ئەمریکییەو مامۆستای رەگەزناسیی و جیهانی کۆنی پێش مێژووە لە دانشگای شیکاگۆ (١٩٥٤- ١٩٧٤). ناوبانگی بە کارەکانی لە کوردستاندا پەیدا کردووە. ئەوەبوو لە جیاتی پەیمانگای خۆرهەڵاتی (شیکاگۆ) یەکەم کنەو پشکنینی زانستی لە یەکەم گوندی کشتوکاڵیدا ئەنجام داوە. (١٩٤٨- ١٩٥٥) ئەو کارە پێشەنگییەی لە (ئەریحا) ئەنجامی داوە بەشێك بووە لەو پرۆژەیە.

٩- هربرت رايت، بروس هاو. نفس المصدر السابق ص ٢٠٧.

١٠- بروس هاو: پسپۆر لە زانستی شوێنەوار.

١١ - بروانە نامەی ژمارە (١) بە زمانی ئینگلیزی کە لە بەرێوەبەرێتی شوێنەواری سلێمانی پارێزراوە.

١٢- هربرت رايت، بروس هاو. نفس المصدر السابق. ص٢٠٧.

١٣- هەربرت رایت: مامۆستای یارمەتیدەرو پسپۆر لە خاك و زانستی چینەکانی خاکدا.

١٤- بروانە نامەی ژمارە (٢) بە زمانی ئینگلیزی کە لە بەرێوەبەرێتی شوێنەواری سلێمانی پارێزراوە.

١٥- هربرت رايت. بروس هاو. نفس المصدر السابق. ص ٢٠٧، ٢٠٨.

١٦- هربرت رايت. بروس هاو. نفس المصدر السابق: ٢٠٧، ٢١٠.

١٧- بڕوانە نامەی ژمارە (٣) بە زمانی ئینگلیزی کە لە بەڕێوەبەرێتی شوێنەواری سلێمانی پارێزراوە.

١٨- بڕوانە نامەی ژمارە (٤) بە زمانی ئینگلیزی کە لە بەڕێوەبەرێتی شوێنەواری سلێمانی پارێزراوە.

١٩- بڕوانە نامەی ژمارە (٥) بە زمانی ئینگلیزی کە لە بەڕێوەبەرێتی شوێنەواری سلێمانی پارێزراوە.

٢٠- بڕوانە نامەی ژمارە (٦) بە زمانی ئینگلیزی کە لە بەڕێوەبەرێتی شوێنەواری سلێمانی پارێزراوە.

٢١- بڕوانە نامەی ژمارە (٧) بە زمانی ئینگلیزی کە لە بەڕێوەبەرێتی شوێنەواری سلێمانی پارێزراوە. بە دوای ئەو نامەیەدا لە (١٦ی تەمووزی ١٩٥٢) بەڕێوەبەری گشتی ئاسەواری کۆن لە بەغدا نامەیەکی لەلایەن Franis.C.Fraser پێگەیشتووە کە تیایدا قسە لە گێڕانەوەی پاشماوە ئاژەڵییەکانی بەردە بەڵکە دەکات. (بڕوانە نامەی ژمارە ٨ بە زمانی ئینگلیزی).

٢٢- الدكتور تقي الدباغ. الوطن العربي في العصور الحجرية. بغداد ١٩٨٨ ص٧٥.

٢٣- الدكتور تقي الدباغ. الوطن العربي في العصور الحجرية. نفس المصدر السابق ص ٧٥.

٢٤- الدكتور تقي الدباغ الموسوعة الصغيرة ٨٨ مقدمة في علم الاثار. ص ٤٣.

*** لێکۆڵینەوەیەکی سەرەتایی لەسەر پاشماوەکانی شوێنەواری کەریم شایەر[1]:-**

**کەمال نوری مەعروف**

لە دوا دوای چاخی بەردینی سەروو ئاوو هەوای ناوچەکانی باشووری خۆرئاوای ئاسیا بە تایبەتی ولآتانی خۆرهەلآتی ناوەراست بەرەو وشکیی وگەرمیی و کەمبارانی رۆیشتووە ئەمەش لە کاتێکدا بووە کە چاخی سەهۆڵین لە ناوەراستی ئەورووپاوە بەرەو کەمبوونەوە رۆیشتووە. واتە سەهۆڵەکە بەرەو باکوور کشاوەتەوەو بووەتە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرماو باران بارینی زۆر لە باکوری خۆرئاوای ئەورووپا[2]

ئەنجامی ئەو گۆرانکارییە لە ئاوو هەوادا ئاژەڵ بەرەو باکوور کۆچی کردووە. لەو بارو دۆخەدا کە ئاژەڵ ناوچەکەی جێ هێشتووەو ژمارەیان کەم بووەتەوە بە تایبەتی ئەو ئاژەلآنەی قەوارەیان گەورە بووە[3]، مرۆڤ هەستی بەوە کردووە کە ژیانی بەرەو ئالۆزیو خراپی رۆیشتووە ئەمەش ترسێکی گەورەی بۆ خۆراکی رۆژانەی دروست کردووەو لە ژیانی گەشبین نەبووە.

ئەم گۆرانکارییە لە ئاوو هەوادا باشووری کوردستانیشی گرتووەتەوەو بووەتە هۆ بۆ ئەوەی مرۆڤ لە ئەشکەوت و پەنا بەردین بە کۆمەڵ بێنە دەرێ و بۆ شوێنە نزیکەکان کۆچ بکەن و لە زەوییەکی گەورەتردا دابنیشن بۆ وەدەست هێنانی خۆراکیان ئەمەش لە رێگای رووەك و راوی ئاژەڵەوە بووە کە دواتر توانیویانە ماڵییان بکەن و یەکەم گوندی کشتوکاڵی لە ناوچەکەدا لە چاخی بەردینی ناوەراستدا دروست بکەن.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشێ ئەویش ئایا مرۆڤی کۆنی باشووری کوردستان کە لە چاخی بەردینی ناوەراستدا لە ئەشکەوت هاتووەتە دەرێ سەرەتای لەدەشتدا نیشتەجێ بوونی لە شوێنەواری کەریم شایەر بووە یان بۆ کۆنتر لەو شوێنەوارە دەگەرێتەوە؟

بۆ وەلآمی ئەم پرسیارە هەمو بەڵگە ئاسەوارییەکان ئەوە نیشاندەدەن کە شوێنەواری کەریم شایەر قۆناغێکی پێشکەوتووە لە شارستانێتی چاخی بەردینی ناوەراست کە نزیکە لە چاخی چەرموو.

بەشێوەیەکی گشتی چاخی بەردینی ناوەراست واتە چاخی کۆکردنەوەی خۆراك و راوی ئاژەڵ زێر لەسەرخۆ و بە وردی لە ولآتانی خۆرهەلآتی ناوەراستدا رۆیشتووە. بەلآم لە کوردستانی عێراق کە یەکێکە لە ناوچە نموونەییەکان مرۆڤ لە تێکۆشانێکی بەردەوامدا بووە بو گۆرینی شێوەی ژیانی کە پاشماوەکانی بەڵگەی بە توانایی دەرئەخات لە ناوچە شاخاوییەکەی کوردستانی باشووردا.

لەزۆرینەی شوێنەوارەکانی دنیاشدا وا دانراوە کە چاخی بەردینی ناوەراست بەردەوام بوونی چاخی بەردینی سەرووە کە، لە ناوچەکەدا نەشو نمای کردووە. واتە ئەم چاخە گۆرانێکە بارودۆخی ئاوو هەواو ژینگەی هێنایە پێشێ لە ژیانی مرۆڤ چونکە هاتوچۆی کۆمەلآنی خەڵکی لەو سەردەمەدا بە هۆی زۆری دارستانەکان کەم بووەتەوە[5].

کەریم شایەر تاکە شوێنەوارێك نییە کە بۆ چاخی بەردینی ناوەراست بگەرێتەوە لەکوردستانی عێراقدا بەڵکو شوێنەواری دیکەش هەن لەوانە زاوی چەمی[6]، مولەفەفەعات[7] گردە چای[8] هەروەها شوێنەواری ئەو چاخەش بە هەموو ناوچەکانی دنیادا لە ئەورووپاو ئەفریقیاو ئاسیا بلآو بوونەتەوە. هەموو ئەو شوێنەوارانە کەلتوری چاخی بەردینی ناوەراست پێك دەهێنن.

باسەکەی ئێمە لێرەدا بە درێژی شوێنەواری کەریم شایەر دەگرێتەوە. کەریم شایەر دەکەوێتە باکووری خۆرهەلآتی چەمچەماڵ لە دووری(٩) کیلۆ مەتر لێوەی[9]

هەروەها دەکەوێتە سەرووی شیوی چەمی گەورە کە بەو ناوە نزیك بە شوێنەوارەکە ناسراوە جگە لەویش قەلآی چەرموو دەکەوێتە باشووری خۆرئاوای لە دووری دوو کیلۆ مەتر لێوەی. شوێنەوارێکی دیکە لێژ دەبێتەوە کە، بە (تورکەکە) ناسراوە لەوێشەوە ئاوەکەی بەرەو خوار دەبێتەوەو تێکەلی کۆمەڵێك لقی تر دەبێت کە بە هەموویان چەمی گەورە پێك دەهێنن.

کەریم شایەر بنکەیەکی دانیشتنی مرۆڤە دەکەوێتە سەر تەپۆلکەیەك لە ناوچەیەکدا کە گردو تەپۆلکەو شیوی زۆرە [10]. خاکەکەی پێکهاتووە لە چینێکی بەردینی پێچاو پێچ توێژێکی گەچینەیی ئەستوری تیا بەرچاو دەکەوێ کە لە چاخی پلاستۆسینیدا دروست بووە[11]. لە رۆخی چەپی شیوی کەریم شایەردا دوو پەنابەر دێنە بەرچاو دەکەون یەکەمیان لە شێوەی چەترێکی کەوانەییدا دەبینرێ. بەردەکەشی مەیلەو خۆڵە مێشییەکی تێری قاوەیی باودا دەروانێت. قوولی ئەشکەوتەکە کە بۆ ناوەوە چوار مەترێك دەبێت. چینێك خۆڵ ناو ئەشکەوتەکەی گرتووە کە شێوە خۆڵە مێشییەو ناتوانین رای تەواوی لەسەر بدەین بە هۆی ئەوەی دانیشتووانی ناوچەکە وەك پەنا بنەیەك بۆ ئاژەڵەکانیان لەسەردەمێکی زووەوە بەکاریان هێناوە. شێوەکە لێرەدا پێش ئەوەی بگاتە دوو پەنا بەردینەکە تەسك دەبێتەوەو پێچ دەخوات دۆڵێکی بچکۆلە دروست دەکات.

پەنا بەردینی دووەم کە ئەوەی باکوورە لەوەی پێشو دەچێ و دراوسێیەتی بەلآم تەپۆلکەیەکی گلێن لە یەکتریان جیا دەکاتەوە، ئەم پەنا بەردینە لەوەی تر نزمترو گچکە تر دەر ئەکەوێت[12].

لەنێوان گردو تەپۆلکەکانی زەوی ناوچەکەدا زەوی دەشتی بە پیت و بەفەر زۆرن کە سەرەتای دروستبوونیان بۆ چینێکی نیشتووی دەریایی دەگەرێتەوە، چینێکی کە چێنەییەولیتە داپۆشیوە ئەمەش لەو کەرەسانە دروست بووە کە لافاو بەرەو شوێنە نزمەکان بردوونی.

لەم رۆژگارەدا ناوچەکە لە دارو درەخت و رووەکی رووتەنە ئەمەش بە هۆی خراپی ئاوو هەواکەیەتی چونکە بارانەکەی لە کاتی دیاری کراوی ساڵدا بە خور دەبارێ و خاکەکەشی بۆشە[13] ئەم جۆرە خاکانەش لە ناوچەی سووری مەیلەو قاوەیی دروست دەبێت کە بە زۆری بەرزایی شێوەکانی ناوچە شاخاوییە ساناکان دەگرێتەوە. لە گلّو

خۆڵی سەرەوەی خاکەکەدا وا دەبینرێ کە ناوچەکە ئاوو هەوایەکی وشکی بەخۆوە گرتووە هەروەها گۆڕانیش لە پلەی گەرمادا بوەو شێوەی گڵی خاکەکەی گۆڕیوە[١٤]. لەو ڕووەوە برەیدوود دەڵێ: لە هەموو ئەو دەشتو شوێنە بەرزەکانی شیوی چەمچەماڵ کە، لە ڕابردوودا پڕ بووە لە دارو درەخت ئێستا هیچ درەختێکی تیا نەماوە. درەختی بەرووی نزم کە دەگمەن ڕێدەکەوێت لە (٦) پێ زیاتر بەرز بێتەوە پێش ئەوەی خەڵوزکەرەکان دەیبرنەوە.

بە نەمانی دارو درەختو ڕووەك گژو گیاش لە بەهاردا لە ڕەگەوە دەریەت چونکە بارانەکەی بە تەوژمەو گڵەکە لادەدا بۆ ئەوەی لیتە بەرەو ڕووبارەکە ڕامالێ لە زستانیشدا لە هەموو لێژاییەکاندا بە خێرایی لیتە دەخاتە ناو ڕووبارەکان هەروەها لافاو ناوچەکە دادەپۆشێ. لێرەدا ئەو سەرچاوەیە دەبینینەوە کە لیتەی دەشتی شیوی نێوان دوو ڕووبارەکە درووست دەکات[١٥].

لە ٦ی تشرینی یەکەمی ساڵی١٩٥٠ نێردراوێکی ئەمریکی پەیمانگای خۆرهەڵاتی سەر بە دانشگای شیکاگۆ لەگەڵ دامەزراوی لێکۆڵینەوەی خۆرهەڵاتی قوتابخانە ئەمەریکییەکان بە سەرۆکایەتی (ڕۆبەرت برەیدوود) کە دەستیان کرد بە کنەو پشکنین لە قەڵاتی چەرموو توانییان گەڕان بە ناوچەی چەرموودا بکەن بۆ ئەوەی شوێنەواری کۆنتر لەو سەردەمە بدۆزنەوە. شوێنەواری کەریم شایەر بۆ ئەو مەبەستە هەڵبژێردرا.

کەریم شایەر ڕووبەرەکەی (٨٠٠٠) مەتری چوارگۆشەیە، لە جیاتی دەزگای کنەو پشکنینی چەرموو (برۆس هاو) بۆ ماوەیەکی کورت کنەو پشکنینی تیا کرد بۆی دەرکەوت کە شوێنەوارەکە دەکەوێتە قوڵییەکی دیاری کراو پێکهاتووە لە چینێکی نیشتەجێ بوون کە ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر چینی گڵی گردەکە. (واتە ژێر توێژاڵی لیتەکە) ئەمەش بۆ سەردەمێکی دواتری ئەو چاخە دەگەڕێتەوە واتە بۆ چاخی بەردینی ناوەڕاست (Mesolithic) دوای سەردەمی زاوی چەمی کە مرۆڤ ژیانی ئەشکەوتی جێ هێشتووەو لە شوێنێکی نیمچە گوند دانیشتووە. دەزگا نێردراوەکە پاشماوەی خانوویان نەدۆزییەوە بەڵکو گەیشتنە دۆزینەوەی چینێك لە بەردی ڕیزکراوی بنچینەی خانووەکە شێوەی دیاریکراو نیشان نادەن. هەروەها ژمارەیەك بەرد دۆزرانەوە هەر یەکێك لەوانە بە قەوارەی مشتی دەست بوون لەگەڵ ئامێری کشتوکاڵی لە بابەتی پاچە کۆڵەی بەردین کە بۆ کێڵان بە کاریان هێناوە (Hoe) لەگەڵ داس کە باوەڕ وایە دەمە داس بۆ بڕینی قامیش بۆ خانوو دروست کردن سوودی لێ بینراوە.

جگە لەوانەش بە کۆمەڵ بەردی ئاگردانو چاڵی تایبەت بە کۆکردنەوەی دانەوێڵە دۆزراونەتەوە. هەروەها پارچەی دۆڵو دەستاڕو پاچەکۆڵەی بەردینی چاك کراو کە ئاماژەن بۆ کشتوکاڵ لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا کە، هەتاکو ئەو کاتە کشتوکاڵ بە دەستی مرۆڤ نەکراوە[١٦].

وا دەرئەکەوێت دانیشتووانی کەریم شایەر ڕاوی ئاژەڵیان زۆر کردبێت. چونکە زیاتر لە نیوەی ئێسقانی ئەو ئاژەڵانەی کە لێرەدا دۆزراونەتەوە لەو جۆرانەن کە ماڵی بن هەر چەندە لەو سەردەمەدا ماڵی نەبوون[١٧].

دەزگای کنەو پشکنین کۆمەڵێك بەردە ئەستێیان دۆزییەوە شوێنەوار ناسکەکان پێی دەڵێن (Microlithic) واتە گچکە.

بەردە ئەستێ کەرەسەیەکی بەربڵاوە کە ئامێرەکانیان لێ دروست کردووە لەوانەش ژمارەیەکی زۆر چەقۆیان بە قەوارەی ئاسایی دۆزیوەتەوە، لەگەڵ کرۆکی پارچەی بەردە ئەستێی چەقۆکان. جگە لە کەرەسەی خۆجوانکردن لە موروو و بازن، بەرمور. هەروەها دەزگای کنە کردنەکە دەرزی سانای دروست کراویان لە ئێسقان دۆزیوەتەوە لەگەڵ دەمە تەورو دوو شێوەی بچکۆلەی لە قوڕ دروست کراو[١٨].

لە سەرو ئەوانەشەوە ئامێری هاڕینی هاڕاوەی سوور دۆزراوەتەوە. هەموو ئەو ئامێرە زۆرانەی لە، کەریم شایەر دۆزرانەوە ئەوە دەگەیەنن کە شوێنەواری کەریم شایەر وەکو کارگەیەك وابووە بۆ دروست کردنی ئەو کەرەسە بەردینانە ئەمەش بە ئاشکرا لە بڕگەیەکی ئەو نامەیەدا دەرئەکەوێت کە، ڕۆبەر برەید وود لە (١٥) مارتی ساڵی (١٩٥١) ناردوویە بۆ دکتۆر (ناجي الاصيل) بەڕێوەبەری گشتیی لە بەغدا کە دوای دوو ڕۆژ کنەکردن تیایدا، دەڵێ: ئێمە دوێنێ لە کەریم شایەر دەستمان بە کنەو پشکنین کرد، لە ڕاستیدا ژمارەی بەردە ئەستێکان ڕۆژانە لە زیاتر بووندایە ئەوانەی ئەمڕۆ و ئەوانەی دوێنێ وامان لێدەکات لەنێوان زۆریاندا نوقم ببین. ئێمە ژمارەیەك بەردی دروست کراومان لەگەڵ پارچە دۆڵێك نیشان دان کە هەموویان وا دەر ئەکەون زۆر چاك بن[٢٠].

سەرەنجامی کنەو پشکنینەکە ئەوە نیشان دەدات کە دەزگای کنەکردنەکە سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە بۆ ئەوەی لە شێوەی خانووی کەریم شایەر تێبگەن، چونکە بەڵگە بەرچاوەکان شێوەی خانووەکانمان ناداتێ، بەڵام ئەگەر بەراوردی کەریم شایەر بکەین لەگەڵ شوێنەوارەکانی تری هەمان سەردەم تێدەگەین کە خانووی چاخی بەردینی ناوەڕاست کە لە ئەورووپا دەرکەوتووە بە شێوەیەکی سانا دروست کراوە هەروەها لە قەوارەشدا بچووك بووە هەروەك لە شێوەی ئەوەی چاخی بەردینی سەروو لەگەڵ خۆیا دانیشتنی ناو ئەشکەوتی هێنابێت بە هۆی ئەو بارودۆخە جوگرافییەی لەسەر دەمەکەدا بڵاوبووە.

چاخی بەردینی ناوەڕاست لەبەر ئەوەی ڕووبەرێکی زۆری زەوی بە دارستانو ڕووەك داپۆشراوە وایکردووە کەرەسەی خانوو دروست کردن زۆر بێت لەگەڵ ئەوەشدا کە ئاوو هەوای گەرم پێویستی بەوە نەکرد لەو سەردەمەدا زەوی بدرنو خانووی تیا درووست بکەن هەر وەکو لە چاخەکانی پێشوودا پەیرەوکراوە. بۆیە دانیشتووانەکە هاتوون لە ناوچەی چەویو لماویدا خانوویان درووست کردووە چونکە لەو شوێنانەدا ڕووەكو دارو درەخت کەمبووە[٢١].

لەمەوە تێدەگەین کە خانووبەرەی کەریم شایەر هۆکانی شوێنگا بە شێوە ساناکەی بێ ئەوەی گرنگی پێ بدەن سنوور بەندی کردووە چونکە مرۆڤ هەتاکو ئەو سەردەمەش نەگەیشتوەتە ئەوەی لە چۆڵیدا بژی، لەگەڵ ئەوەشدا کەمی

ماوەی کنەو پشکنینەکە وای کردووە کە نەتوانێ سەر ئەنجام زانیاری نوێمان لەو رووەوە پێبدات. بۆیە کنەکردنی تازە لەو شوێنەوارەدا جارێکی تر پێویستە بەمەبەستی وەدەست خستنی زانیاری نوێ لەو رووەوە. لەوانەشە ئەگەر ئەو کنەکردنە ئەنجام بدرێ بتوانین زانیاری لەسەر شێوەی خانووەکانیان وەربگرین. وەکو ئاشکراشە خانوو لەو چاخەدا شێوەی بازنەیی هەبووە.

پرۆفیسۆر (رۆبەرت برەید وود) رای وایە کە شوێنەواری کەریم شایەر شوێنی دانیشتنی وەرزی ساڵانەی مرۆڤ بووە کە تیایدا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ماوەتەوە[٢٢] ئەو مانەوەیەشی لە وەرزەکانی هەوا خۆشیدا بووە.

ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە شوێنەوارەکە چەشنی سەربازگەیەکی هاوینە بووە یان شوێنی رەشماڵی کۆچەرییان بووە لە نزیك سەرچاوەی ئاو بۆ راوکردن هەڵیانداوە.

ئەمەش نیشانەی ئەوەیە مرۆڤەکانی هەمان مرۆڤی دانیشتووی ناو ئەشکەوتی چاخی بەردینی کۆنی سەروون بە هاتنە دەرەوەیان بەهۆی ئاوو هەوای تازەی شوێنگاکەیانەوە گۆڕان لە ژیانو بیرکردنەوەیانو ئامێری دروست کراوی بەردینییان بەرچاو دەکەوێ بۆ ئەوەی ژیانی رۆژانەیان پێش بخەنو کەرەستەی تازە بۆ یەخسیرکردنی ژینگەی تازەیان دروست بکەن. لە زستانیشدا جارێکی تر دانیشتووانی کەریم شایەر بۆ خۆپاراستن لە سەرماو سۆڵەی زستان پەنایان بردووەتە بەر ئەشکەوتو پەنا بەردینە نزیکەکان.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت دانیشتووانی کەریم شایەر لە ساڵێکدا وەکو کۆچەری دوو کۆچیان هەبووە یەکەمیان هاوینە بووە بۆ پێدەشتەکان هەروەها کۆچی زستانەش بۆ ئەشکەوتەکان. بەو جۆرە ئاوو هەوا هاتوچۆی ئەو مرۆڤانەی پێوەند کردووە ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە مرۆڤ لەو چاخەدا نەیتوانیوە لە وەرزەکانی ساڵدا بە تایبەتی وەرزی تەرو تووشیدا لە دەرەوەی ئەشکەوت بمێنێتەوە هەر ئەوەش وای کردووە خانووەکەی چەشنی کوخی جوتیار لە وەرزی هاویندا دروست بکات، بە بڕوای من نزیکترین ئەشکەوت، یان پەنا بەردینە بۆ کەریم شایەر دوو پەنا بەردینە نزیکەکەی شوێنەوارەکەیە کە توانیویانە لە زستاندا تیا بژینو لە سەرماو سۆڵە خۆیان بپارێزن یان پەنایان بردوەتە بەر ئەشکەوتی پاڵە گەورە[٢٣] کە دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی یا وەکو بۆ ئەشکەوتی هەزار مێردی شاخی بەرانانی قەرەداغ لە خۆرئاوای سلێمانی رۆیشتوون.

لە ئەشکەوتی پاڵە گەورەدا زانایانی شوێنەوار هـ. ئی. رایتو بروس هاو ساڵی (١٩٥٠) کنەو پشکنینیان تیا کردو لە چینی یەکەمیدا ئامێرو کەرەسەی بەردینی سەردەمی کەریم شایەریان دۆزییەوە کە بەڵگەی شارستانێتی هەردوو شوێنەوارەکە واتە کەریم شایەرو چینی یەکەمی ئەشکەوتی پاڵە گەورەیە کە بۆ سەردەمێك دەگەڕێنەوەو دانیشتووانی ناوچەکە دروستی کردوونو نیشانی دەدەن[٢٤] جگە لەوەیش لە ئەشکەوتی هەزار مێرد چینی B هەمان جۆر لە ئامێرو کەرەسەی بەردینی چاخی ناوەراست لە کاتی کنەو پشکنینەکەی GARROd Dorothy A D لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٨) دۆزرانەوە کە سەردەمەکەی بۆ کۆتایی کردنەوەی چاخی خۆراك دەگەڕێتەوە.

ئەمەش بەڵگەیەکی ترە بۆ چاخی بەردینی ناوەراستو دانیشتووانەکەی کە چۆن لە وەرزی زستاندا پەنایان بردوەتە بەر ئەشکەوتەکان[٢٥].

کنەکردن لە کەریم شایەردا هەندێ چاڵی دەرخستووە کە بۆ کۆکردنەوەی دانەوێڵە بەکار هێنراون ئەمەش نیشانەیە بۆ کۆکردنەوەی دانەوێڵەی کێوی لە وەرزی هاتنە بەرهەمیدا بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستیا کاتێك مرۆڤەکە بۆ پەنا بەردینە زستانییەکەی دەگەڕێتەوە لەگەڵ خۆیا بیگوێزێتەوە بێ ئەوەی بگاتە بەرهەمهێنانی خۆراك، ئەو بوو مرۆڤ لە قۆناغێکی دواتردا پێویستییەکانی رۆژانەی وای لێکرد کە هەڵبستێت بە یەکەم ئەزموونی لە بواری کشتوکاڵو بەرهەم هێنانی خۆراکدا.

کاری سەرەکی رۆژانەی دانیشتووانی کەریم شایەر هەر وەکو وتمان راوی ئاژەڵو کۆکردنەوەی دانەوێڵە بووە، ئەمەش لە ژمارەی زۆری ئێسقانی ئاژەڵە دۆزراوەکاندا دەرئەکەوێت کە لە ٥٠٪ ی ئەو ئێسقانە دەرهێنراوانە لەو جۆرانەن کە مرۆڤ لەبەر هۆی ئابوری ماڵی کردوون[٢٦]. ئەمەش نیشانەیە بۆ ئەوەی مرۆڤ ئاژەڵی دەستەمۆ کردووە بۆ ماڵی کردنی. گومانیش نییە راوی وشکانییو ئاوی سیفەتێك بووە لای دانیشتووانی کەریم شایەر کە هەتاوەکوو ئەو قۆناغەی ئاژەڵ ماڵی نەکراوە. مامۆستا سیتون لوید لەو رووەوە دەڵێ:-

ماڵی کردنی ئاژەڵ سیفەتێکی تایبەتە بە قۆناغی کشتوکاڵ کردنو نیشتەجێ بوونی بەردەوام. مرۆڤیش هەتاکو ئەو کاتە بیری لەوە نەکردووەتەوە کە گوندی کشتوکاڵی دروست بکاو تیا جێگیر بێت[٢٧].

مامۆستا سیتون لوید رای وایە ئەودوو شێوەیەی لەناو پاشماوەکاندا دۆزراونەوە دەرچوونە لە ژیانی چاخی بەردینی کۆن[٢٨].

واتە دروست کردنی ژیانێکی نوێیە کە قۆناغێکی تازەیە لە ژیانی مرۆڤ. بۆیە وای بۆ دەچم ئەو دوو شێوەیە خاڵێکی گەشبینە بۆ رزگاربوونی مرۆڤ لە شێوازی چاخی بەردینی کۆنو ناسینی چوار دەورەکەیو دۆزینەوەی خودی لەناو هونەرەکەیدا. ئەمەش لەوەوە هاتووە مرۆڤ هەستی بەوە کردووە کە کاتی زۆرە بۆ بیرکردنەوە بۆ ئەوەی لە هونەرو پیشەسازییەکەیدا رەنگ بداتەوەو پێش بکەوێت. ئەو هونەرو پیشەسازییەش لە کۆمەڵگادا دروست نابێت ئەگەر ئەو کۆمەڵگایە لە کارەکانیدا پسپۆڕ نەبن.

لە کاتی کنەو پشکنیندا کەرەسەی خۆجوانکردن دۆزراوەتەوە ئەوەش نیشانەی ئەوەیە دانیشتووانەکەی کەریم قۆناغی سەرەتای ژیانیان بڕیوەو هەتا سنوورێك زەوقی هونەرییان بەرەو پێشی بردوون ئەمەش سەرەتایەکە بۆ نزیك بوونەوە لە چاخی بەردینی تازە. ئەوەی لێرەدا جێی تێرامانە، حەزی مرۆڤە لە خۆجوان کردن لەوە دەچێت لەم کارەیدا ویستبێتی لاسایی باڵندەکان بکاتەوە لە رەنگە ئالوواڵاکانیاندا ویستبێتی چەشنی سروشت رازاوە بێت بە

گوڵ و گوڵاڵەی[29].

دەرنەكەوتنی گۆڕ لە شارستانێتی كەریم شایەردا لەوە دەچێت هۆكەی بگەڕێتەوە بۆ كەمی رووبەری ئەو زەوییەی كنەو پشكنینەكەی تیا ئەنجام دراوە. وەكو زانراویشە پێش سەردەمی كەریم شایەر گۆڕ هەر بووە بە بەڵگەی ئەوەی لە ژمارەیەك شوێنەواری سەر بەو چاخە لە كوردستان دەركەوتووە نموونەش بۆ ئەمە چینی یەكەمی ئەشكەوتی شانەدەرە كە بۆ دانیشتووانی گوندی زاوی چەمی دەگەڕێتەوە. بۆیە پێ دەچێت هەمان دەستوور گۆڕی مرۆڤی شارستانیتی كەریم شایەریش یان لەناو ئەو دوو پەنا بەردینە نزیكەدا بن كە دەستی كنەو پشكنین نەیانگەشتوونێ یان ئەوەتا لە چینی سەرەوەی ئەشكەوتی پالە گەورەدا هەبن كە كنەو پشكنین تیایدا پاشماوەكانی ئەو چاخەی دەرخست. جگە لەوانەش ئەشكەوتی (هەزار مێردی خۆرهەلات)یش كۆمەلێك ئێسقان دۆزرانەوەو لەلایەن (كارلتون كون) لێكۆلینەوەی لەسەر كراو بۆ چاخی بەردینی تازەی گێرانەوە[30]. پێی دەچێت هەر پاشماوەی ئەو چاخە بێت. هەر چونێك بێت داهاتوو دەتوانێت سنوورێك بۆ هەموو ئەو ئەگەرانە دابنێت كە چۆن مرۆڤی كەریم شایەر مردووەكانی ناشتووە یان لە ترسانا كردوویەتی بەژێر گڵەوە بۆ ئەوەی درندەی كێوی یاری بە لاشەكەی نەكاو نەیخوات.

خاڵێكی تری گرنگ هەیە پێویستە باسی بكرێ ئەویش بەردە ئەستێییە كە گرنگی خۆی هەیە لە ریزكردنی ئەو كەرەسە ئامادەكراوانەی لە كەریم شایەر دۆزراونەوە كە، كەرەسەیەكی بەربلاوە ئامێری بەردینی وردی لێ دروست ئەكرێ بە پێچەوانەی چەرموو كە ئامێرە بەردینییەكانی لە بەردی شووشەی گركانی رەش دروست بووە.

بە بەراوردێك لەنێوان پاشماوەكانی شوێنەواری كەریم شایەرو شوێنەوارەكانی تری وەكو (مولەففەعات)و (چای) دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە هەردوو شوێنەوارەكە كەلتوری سەردەمی كەریم شایەر نیشاندەدەن.

پاشماوەكانی مولەففەعات پێكهاتووە لە پاچە كوڵەی بەردین و دۆڵ جگە لە ئێسقانی ئاژەڵ لەوانەی كە، لە كەریم شایەر دۆزراونەوە. بۆیە وەكو قۆناغ لەگەڵ كەریم شایەر یەكدەگرنەوە بەراوردێكی دیكەش لەنێوان كەریم شایەرو پاشماوەكانی گردەچای دەگەینە ئەو ئەنجامەی ئەمەی دووایییان واتە گردە چای دەكەوێتە نێوان زاوی چەمی وچەرموو هەروەها پیشەسازییەكەشی لە ئامێرە بەردینەكانی كەریم شایەرو مولەففەعات دەچن، كەواتە نیشتەجێ بوونی مرۆڤ لە (مولەففەعات) بە هۆی بیناسازی و پیشەسازی بەردینی باشەوە پێناسە كراوە ئەوەش نیشانی دەدات كە هاوچاخی كەریم شایەر بێت بە تایبەتی لە دەمەتیخە وردەكانداو جۆرەكانی ئامێری لێكەرەوە. ئەوەی لێرەدا جیاوازی لەنێوانیاندا دروست كراوی (مولەففەعات)ە كە، لەوانەی كەریم شایەر باشترە.

وا دەردەكەوێت مولەففەعات چاخێك لە ژیانی گوندنشینی دوای چەرمو نیشان بدات ئەمەیش راستییەك دەرئەخات كە، وەكو سەردەم تازەتر بێت لە كەریم شایەر.

لەو روانگەیەوە پێویستە كەلتووری ئاشكرای پێش مێژووی كوردستانی عێراق واتە چاخی كەریم شایەر جارێكی تر بەراورد بكرێ لەگەڵ پاشماوەی شوێنەوارەكانی ناوچەی دەریای سپی ناوەراست بۆ ئەوەی بگەینە ئەنجامێك كە ئایا ئەو لەیەكچوونەی نێوان لە رووی پاشماوەكانەوە لە ئەنجامی كۆچێكی تازەی مرۆڤ هاتووەتە گۆڕێ كە ناوچەكەی گرتووەتەوە یان گۆرانكارییەكی ناوچەییەو هۆی تایبەتی بۆ دروست بووە.

ئەو كنەو پشكنینانەی لە ئەشكەوتی (شەقبەی) دۆڵی (نطوف)ی ئەنجام دراوە دەری ئەخات كە پاشماوەی ئاسەواری (نطوف)ی ناوچەیەكی گەورەی لە رۆخی دەریای سپی ناوەراست گرتووەتەوە بەڵكو بەرەو باكوور هەتا وەكو سوریاو ئەردەنیش گەیشتووە. لە باشووریشدا ناوچەی (حەلوان)ی لە میسر گرتووەتەوە. دانیشتووانی ئەو شارستانییەتە لە ئەشكەوت و پێدەشتەكانیدا جێگیر بوون و مردووەكانیان لە شوێنی جێگیربوونیاندا لە گۆڕ ناوە. لەگەڵ هەندێك لە مردووەكانیشدا ئامێرو كەرەسەی خۆجوان كردن دۆزراوەتەوە. ئەو ئامێرانەی لە قۆناغی یەكەمی مێژوویاندا بەجێیان هێشتووە نیشانی دەدات كە پەنایان بردووەتە بەر راوكردن لەگەڵ كۆكردنەوەی دانەوێڵە كە بە پلەی دووەم دێت. بەراوردێك لەنێوان پاشماوەكانی (نطوف)ی فەلەستین و كەریم شایەر دا بۆمان دەرئەكەوێت لە هەدوولا راكردن و كۆكردنەوەی دانەوێڵە یەك دەگرنەوە. لە رووی پاشماوەكانی دیكەشەوە هاو شێوەن تەنیا گۆڕ نەبێت كە، لە كەریم شایەردا دەرنەكەوتووە.

بەراوردێكی دیكەش لەنێوان پاشماوەكانی ئەم چاخەی كەریم شایەر لە گەڵ شوێنەواری راوكردنی ئاژەڵ لە (مریبط) ی یەكەم لە خۆرهەلاتی شاری حەلەب لە چوار چینی نیشتەجێ بووندا دەری ئەخات كە دانیشتن لێرەدا وەرزی بوە. لە (3) چینی سەرەوەیدا شوێنی ئاگردان و خوڵە مێش دۆزراونەتەوە. لە چینی یەكەمدا پاشماوەی كوخی بازنەیی لە قوڕ دروستكراوو هەروەها دۆزینەوەی ئامێری بەردە ئەستێ لەگەڵ ئامێری كونكردنی داس و لێكەرەوەو سەرەتیرو پاچە كوڵەو مووری لوولەیی هەروەها دۆزینەوەی پاشماوەی ئێسقان لە جۆری ئاسك و كەرە كێوی و باڵندە. لێرەدا دۆزینەوەی پاشماوەكانی رووەك بەڵگەی بوونی جۆی كێوی نیشان دەدات. بەراوردێك لەنێوان كەریم شایەرو ئەو شوێنەوارە لە رووی پاشماوەكانییانەوە ئەوە نیشان دەدەن لە خاڵەكاندا یەكدەگرنەوە تەنیا ئەوەی جیاوازییە، لە كەریم شایەر گەنم دەركەوتووە بەلام لە (مریبط)ی یەكەم بەڵگەی بوونی جۆ بە دەستەوە دەدات. بەراوردێكی دیكەش لەنێوان چاخی بەردینی ناوەراست لە كوردستانی عێراق كە لە پاشماوەكانی كەریم شایەر دەیبینینەوە لەگەڵ پاشماوەكانی شوێنەواری (سەبیلییە)ی میسری هەمان چاخ ئەوە دەگەیەنێت كە ئەمەی دوایییان گۆڕانكارییەكە لە شارستانێتی لیڤا لوازی وەرگیراوەو كارتێكردنی دەرەوەی بە سەرەوە نییە بەڵكو لەناو سنووری میسردا گەشەی كردووە. لەو رووەوە ئەوەی لێرەدا بەرچاو دەكەوێ ئەوەیە كە

شوێنەواری چاخی بەردینی ناوەراست لە میسر کارتێکردنی شارستانێتی (نطوف)ی فەلەستینی پێوە دیارە. کەمی ئەو ئاسەوارانەش کە تیایدا دۆزرانەتەوە هۆکەی بۆ دەگەرێتەوە کە، کەوتووەتە ژێر پاشماوەی قوڕو لیتەی ڕووباری نیل چەشنی ئاسەوارەکانی شارستانێتی کەریم شایەر لە ناوچەی چەمچەماڵ کە لە ژێر چینێکی قوڕو لیتەدا دروست بووە. پاشماوەکانی شوێنەوارەکەی میسریش ئەوە نیشان دەدات کە مرۆڤ دانەوێڵەی کێوی بۆ ژیانی ڕۆژانەی بەکار هێناوە هەروەها ئامێرە بەردینە وردەکانیشی بە تەنیا بەکار نەهێناوە بەڵکو بە قیر لەسەر تەختەیەك یان ئێسقانێك بە یەکیەوە بەستوون بۆ ئەوی دروێنەی دانەوێڵەی کێوی پێ بکات هەمان دەستوور ئەم دیاردەیەش لە شارستانێتی (قەفصی) لە وڵاتی (مەغریب)دا دەرئەکەوێت و[31] ئامێرە بەردینەکانی لەم چاخەدا گچکە بوونەتەوەو شێوەی ئەندازیاری جیاجیایان هەبووە سەرەنجام: لەبەر تیشکی هەموو ئەو زانیارییانەی سەرەوە دەتوانین بڵێین:-

١- لەیەکچوونی شارستانێتی کەریم شایەر لەگەڵ شوێنەوارە جیاجیاکانی تری وەکو ئەوانەی فەلەستین و میسرو وڵاتی مەغریب لەو چاخەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە مرۆڤ بەهۆی ئەو گۆڕانکارییەی بەسەر ئاوو هەوادا هاتووە ناوچەکەی کەوتووە سەر هێڵی هاتوچۆی کۆچی جوگراف.

٢- کەریم شایەر قۆناغێکی شارستانێتی پێشکەوتووە لە ژیانی مرۆڤ ئەوەکو سەرەتای هاتنەدەرەوەی مرۆڤ بێت لە ژیانی ئەشکەوت، لەو نامەیەدا دەرئەکەوێت کە شوێنەوارناس (لیندا برەید وود) بۆ زانای شوێنەوارناس فوئاد سەفەری نووسیوە کە تیایدا دەڵێ: ئەو بەردە ئەستێیانە کە لە هەرسێ شوێنەواری (گاوری خان)، (کەریم شایەر)، (تورکەکە) هەڵگیراونەتەوە رای خۆمت پێ ڕادەگەیەنم، کەوا دەرئەکەوێ (ئەتوورکەکە)و نە (گاوری خان) لەو جۆرە بەردە ئەستێیانەیان تیا نییە کە لە چەرموو دۆزراونەتەوە بەڵکو ئەوانە نزیکترن لە زەرزی وەك لە چەرمو[32].

لەوانەیە هەردووکیان لە دوای زەرزییەوە بن. بۆیە لەنێوان ئەشکەوتی هەزار مێردو کەریم شایەردا بۆشاییەك لە چاخەکانی پێش مێژوو بەدی ئەکرێ کە، ڕیزکردنەکە بەم جۆرە دەبێت.

چەرموو:-

مولەففەعات، گردە چای

کەریم شایەر؟

زاوی چەمی

تورکەکە، گاوری خان

زەرزی، پاڵە گەورە، هەزار مێرد B شانەدەر B

٣- کەریم شایەر قۆناغی دابەشکردنی کارە لەناو خێزاندا لەو سەردەمە زووەی کوردستاندا کە بۆ یەکەم جار پیاو بە ڕاوکردنەوە خەریك بووەو ئافرەتیش کاری ناو خێزان و کۆکردنەوەی دانەوێڵەی لە ئەستۆ گرتووە.

*** سەرچاوە و پەراوێزەکان:**

١- لای شوێنەوارناسەکان شوێنەوارەکە بە کەریم شایەر پێناسە کراوە، ئەمەش ناولێنانێکی تازەیەو پەیوەندی بە رابوردووی شوێنەکەوە نییە. لەوە دەچێت وشەی شایەر بە کەسێك لە ناوچەکەدا وترابێت کە گۆرانی بێژ بووبێت یان ئەوەتا پیاوێکی ناسراوو دەرکەوتوو بو بێت.

٢- سومر الجزء الاول والثاني. المجلد الثلاثون (١٩٧٤). ص١٤.

٣- حضارة العراق. ج٣، (١٩٨٥). ص٧٧.

٤- سومەر هەمان سەرچاوەی دووەم. ل ١٤.

٥- الدكتور محمد السيد غلاب. الدكتور يسرى الجوهري. الجغرافيا التأريخية. عصر ماقبل التأريخ وفجرها. ص ٣١٢.

٦- گوندی زاوی چەمی دەکەوێتە سەر ڕۆخی زێی گەورە هەروەها دەکەوێتە خۆرئاوای ئەشکەوتی شانەدەر لە دووری چوار کیلۆمەتر لێوەی. کنەوکردن لەو شوێنەوارەدا لەلایەن رالف سۆلکی یەوە دەستی پێکرد دوای تەواو کردنی کنەو پشکنینەکانی لە ئەشکەوتی شانەدەر. لە ئەنجامی ئەو کنەو پشکنینانەدا پاشماوەی کوخی بازنەیی تیا دەرکەوت لەگەڵ ژمارەیەك کەرەسەی ناو ماڵ کە سەرەتایی بوون دۆزرانەوە. راوی ئاژەڵ کاری سەرەکی دانیشوانەکەی بووە. هەروەها کۆمەڵێك گۆڕ لە چینی BT ی ئەشکەوتی شانەدەر دۆزراونەوە لەوە دەچێت هی خەڵکی ئێرە بن.

بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: طه باقر، مقدمه في تأريخ الحجارات القديمه ج١ ص ١٨٤.

٧- شوێنەواری مولەففەعات: دەکەوێتە پارێزگای موسڵ لەسەر گردێکە دەڕوانێت بەسەر ڕووباری (خازەر)دا سەردەمەکەی بۆ چاخی بەردینی ناوەڕاست (مێولیشی) هەزارەی دەیەمی پ.ز دەگەرێتەوە. خاتو برومان ساڵی (١٩٥٤) کنەو پشکنینی تیا کردوە کۆمەڵێك ئامێرو کەرەسەی تایبەتی بە چاخی بەردینی ناوەڕاستی تیا دۆزییەوە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: د. احمد سوسة. الريءالحضارة في وادي الرافدين. ج ١ ص٣٢٠.ء طة باقر مقدمة في تأريخ الحضارة القديمة ج ١ ص ٩٠زء: د.فرج بصمة جي سومر.

٨-گردە چای لە پارێزگای هەولێرەو دەکەوێتە سەر تەپۆلکەیەك لە ڕۆخی چەپی ڕووباری زێی گەورە نزیك گوندی گردە مامك. خاتو برومان لە ئەنجامی کنەو پشکنینەکانی ساڵی (١٩٥٤) ئامێری بەردینی چاخی ناوەڕاستی تیا دۆزییەوە.

بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: سومر. ج٢، (١٩٥٥). الجلد الحادي عشر ص١٢٥.

٩-طه باقر. مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة ج١. نفس المصدر السابق ص ١٩٠.

١٠-د. فرج بصمه جی. سومر. ج٢ نفس المصدر السابق. ص ١٢٥.

١١-د. فرج بصمه جی. نفس المصدر السابق ص١١٤.

١٢-إضبارة كەریم شایەر. المرقمة ٧١٣/ ٣٨ المحفوظة لدى مديرية آثار السليمانية.
١٣- د. شاكر خصباك. العراق الشمالي. ص١١٨.
١٤- د. فرج بصمة جي. نفس المصدر السابق ١١٤.
١٥- سيتون لويد. آثار بلاد الرافدين. ترجمة د. سامي سعيد الأحمد ١٩٨٠ ص٣٧.
دیاریكردنی ئەو رۆژە لە فایلی قەڵا چەرموو وەرگیراوە كە، لە بەرێوەبەرێتی شوێنەوار پارێزراوە.
١٦- طه باقر. مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة ج١. نفس المصدر السابق. ص ١٩٠: جريده العراق العدد ٦٠١ في ١٩٧٨/٢/١٨.
١٧- سيتون لويد. نفس المصدر السابق ص ٢٠٣.
١٨-سعدي الرويشدي. نظرة في منجزات إنسان ماقبل التأريخ في ضوء الدراسات الحديثة. سومر ج ١، ٢م ٢٦ ص ٣٨٦، ١٩٧٠.
١٩- ئەو نامەیە لە فایلی كنەو پشكنینەكانی قەڵا چەرموو دایەو لە بەرێوەبەرێتی شوێنەواری سلێمانی پارێزراوە.
٢٠- د. محمد السيد غلاب. يسري الجوهري. نفس المصدر السابق. ص ٣١٢- ٣١٣.
٢١-سيتون لويد. نفس المصدر السابق. ص ٣٤.
٢٢-ئەشكەوتی پاڵەگەورە. دەكەوێتە باكووری خۆرهەڵاتی شوێنەواری كەریم شایەر. پاڵە گەروە ناوی لوتكەی شاخەكەیە كە ئەشكەوتەكەی تیایەو پێكهاتووە لە (٣) ئەشكەوتی نزیك بە یەك، دەمەكانیان لە شێوەی (٣) گۆشەیەكی سەرەو خوار دان گەورەكەیان دەكەوێتە لای چەپ، پانییەكەی ٣و٥ مەترەو قوڵییەكەشی (٨) مەترو بەرزییەكەی مەترێكە. شوێنەوارناس سەبری شوكری ژمارەیەك پارچە سواڵەتی چاخی نەوینەواو سواڵەتی خوری كە بۆ نیوەی یەكەمی هەزارەی دووەمی پ. ز دەگەرێتەوە تیا دۆزییەوە، لەگەڵ ژمارەیەك پارچەی بەردە ئەستێ.
بۆ زیاتر زانیاری بروانە: فایلی ئەشكەوتی پاڵە گەروە ژمارە ٢٤٩/ ٣٧ كە لە بەرێوەبەرێتی شوێنەواری سلێمانی پارێزراوە.
٢٣- د. فرج بصمة جي. سومر ج٢، (١٩٥٥) نفس المصدر السابق. ص ١٢٤.
٢٤- د. فرج بصمة جي. نفس المصدر السابق. ص ١١٨- ١١٩.
٢٥- د. تقي الدباغ. الوطن العربي في العصور الحجرية. بغداد (١٩٨٨) ص ٨٦.
٢٦- سيتون لويد. نفس المصدر السابق ص ٣٤.
٢٧- سيتون لويد. نفس المصدر السابق ص٣٥.
٢٨- د. محمد السيد غلاب. د. يسري الجوهري نفس المصدر السابق ص ٣٣٤.
٢٩- دەقی راپۆرتەكە بە زمانی ئینگلیزی نووسراوەو لە فایلی ئەشكەوتی هەزار مێرد پارێزراوە كە ژمارەكە ٣٥/ ٣٧.
٣٠- بۆ هەموو ئەو بەراورد كارییەی كەریم شایەر لەگەڵ شوێنەوارە دورەكانی وڵاتانی تردا سوود لەم سەرچاوەیە بینراوە: د. تقي الدباغ. الوطن العربي في العصور الحجرية. نفس المصدر السابق. ص ٨٨، ٨٩، ٩١، ٩٤، ٩٥.
٣١-ئەو بەڵگەنامەیە لە فایلی قەڵا چەرموودا پارێزراوە كەمولكی بەرێوەبەرێتی شوێنەواری سلێمانییە.
٣٢-لە سەردانێكماندا بۆ گوندی كانی سارد لە ناوچەی چەمچەماڵ نزیك بە شوێنەواری كەریم شایەر لە ١٩٨٨/٨/٢ توانیمان زانیاری زۆر لەسەر ناوچەكە كۆبكەینەوە. سەرئەنجام بۆمان دەركەوت كاری ئێستای دانیشتووانی ناوچەكە كە ئاژەڵدارییە ئەوەی لە دانەوێڵە ساڵانە خێزانێك تۆوی دەكات دەستكەوتەكەی بە قەوارەی دابین كردنی نانەكەیەتی كە سودی لێ دەبینن بەو سیفەتەش لەگەڵ دانیشتووانی قەڵا چەرموودا یەكدەگرنەوە كە لەو سەردەمە زووەدا هەر خێزانێك بە قەوارەی پێویستی ساڵانی پاشەكەوتی لە دانەوێڵە بووە.

## * ڕۆڵی شارستانی ناوچەی کەرکوك لە ماوەی چاخەکانی پێش مێژوو لە عێراقدا:-

د. حوسێن یوسف حازم

ناوچەی کەرکوك ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاوی بینیووە بەهۆی گرنگی شوێنی جوگرافیو بوونی گوندەکانی لە ئاستی شارستانیو مرۆڤایەتی لە ماوەی چاخەکانی پێش مێژوو، لەو چاخە گرنگانەی مێژووی عێراق کە ناوچەکانی باکووری پێ دەناسرێتەوە، شوێنێکی بەرچاوو سەرەکی هەبووە بەهۆی بوونی ژینگەو ئاوو هەوایەکی سازگار.

ناوچەی کەرکوك یەکێکە لەو ناوچانەی کە تایبەتە بە گرنگی ژینگەو ئاووهەواو سەرچاوەی ڕووەکیو ئاژەڵی گەورە، کە پاڵنەرێکی بەرچاو بوو بۆ نیشتەجێبوونی مرۆڤ لەو ناوچەیەدا، کەوتووەتە ناوچەیەکەوە لەنێوان بانی تەختو نیمچە چیایی تێدایە کە هاوسنوورە لە گەڵیدا، ناوچەیەکی هاوگونجاوە لەنێوان چیا بەرزەکان لە سەروو سەرووی ڕۆژهەڵاتو دەشتاییە نزمەکان لە خواروو کە بەرزییەکەی (٢٠٠) مەتر بۆ (١٠٠٠) مەترە، ڕێژەی (١٥٪) ی ڕووبەری عێراق پێك دەهێنێت[١].

ئەم ناوچەیە گەلێك سەر چاوەی ئاوی پێدا تێپەڕدەبێت: وەکو خاپوور، زێی گەورە، زێی بچووك، عوزێم، دیالە، کە نزیکەی (٧٠٪)ی ئاوەکەی بڵاوەی پێکیراوەو دەڕژێتە ڕووباری دیجلەوە کە دەشتاییو دۆڵی دروستکردووە لە ناوچەکانی موسڵ، هەولێر، سلێمانی، کەرکوكو بەشێك لە دیالە، ناوچەیەکی شەپۆڵ شەپۆڵە گرنگی خۆی هەیە کە مرۆڤی فێری کشتوکاڵو گواستنەوە لە ژیانی کۆکردنەوەی خواردن بۆ بەرهەم هێنانی خواردن، هەروەها سەرهەڵدانی گوندی کشتوکاڵی لە چاخی بەردینی نوێو کانزایی[٢].

ئاوو هەوای ئەم ناوچەیە ئاوو هەوای بیابانیەکە ئاووهەوایەکی گوێزراوەیە[٣]. ئەم ئاوو هەوایە بە ناوبانگە بە پلەی گەرمای مام ناوەندیو ڕێژەی پێویست لە بارینی باران کە دەورێکی باڵای هەیە لە پێگەیاندنی کشتوکاڵ لەو ناوچەیەو سەرکەوتنی، کە ناوچەکانی دەریایی سپی ناوەڕاست پێی بە ناوبانگە[٤].

یەکێك لەو کۆڵەکە گرنگانەی کە دەوری بینیووە لە ناوچەکە، بوونی سروشتێکی تازەی خۆرسك لەگەڵ بوونی ڕێژەیەکی بەرچاو لە گژوگیاو ئاژەڵ، هەروەها ماڵیکردنی بە شێکیان لەو ئاژەڵانە لە چاخی بەردینی نوێ، کە تاکو ئێستاکە کە بەشێکی بەرچاوی لە ناوچەکە ماوە[٥].

گەلێك لەو شوێنو گوندە کۆنانە هەیە، بەناوبانگە بەو بەرزاییە گردییانەی کە کەوتووەتە ئاقاری کەوانەی بە پیتی زەوی[٦].

کەرکوکیش بە یەکێك لەو ناوچانە ئەژمارە دەکرێت کە بەناوبانگە بە ژینگەیەکی سروشتی چاك، گەلێك ڕووەكو ئاژەڵی کێوی تێدایە کە هاوگونجاوە بۆ کشتوکاڵو ماڵیکردن، هەروەکو ئەوەی ئاماژەی پێکراوە، یان باوەڕی زۆر هەیە لەلایەن لێکۆڵەرەوانی تایبەت لە پێشیانەوە لێکۆڵەرو شوێنەوارناس (ڕۆبرت بریدوود)ە کە وای دەبینێت، ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆنو ناوچەکانی سەروو سەرووی ڕۆژهەڵات لە عێراق هاوگونجاوی ئەو ژینگەیە، زۆری ئەو شوێنە کەونارانە پێی دەوترێت:-

Natuta / Habitat zone

بە کورتکراوەیی (N. H. z) بە مانای نیشتەجێ سروشتی بە بوونی ڕێژەیەکی زۆر لە ڕووەكو ئاژەڵی کێوی کە دەتوانرێت ماڵی بکرێت[٧].

بەپێی ئەو بەڵگە شوێنەوارییانەی کە لە ناوچەکە دۆزراوەتەوە ئەوە دەخەنە ڕوو بە بوونی کۆنترین کۆمەڵگەی کشتوکاڵی کە پێکهاتووە لە سەرچاوە سەرەتاییەکانی بەرووبوومی کشتوکاڵی لە پێشەوە گەنمو جۆ ئاژەڵی کێوی کە بۆ ماڵیکردن دەست دەدات وەکو مەڕوبزنو ڕەشەووڵاخ وبەرازو ماڵاتی تر.

زۆربەی ئەو پشکنینانە ئەوە دەخەنە ڕوو کە لەوناوچانەو کەرکوکدا سەرەتای بنەڕەتی کشتوکاڵو ماڵیکردنی ئاژەڵان ( تەنها سەگ نەبێت) بوونی هەبووە[٨].

لێکۆڵەری شوێنەواری (Reed) ئەوە دەخاتە ڕوو کە کشتوکاڵو ماڵیکردنی ئاژەڵو بەرهەمهێنانی خۆراك لەم ناوچەیە لە کۆمەڵگە کشتوکاڵییەکانی سەری هەڵداوە[٩].

بەشێوەیەکی تایبەت لە ناوچەکانی سەرووسەرووی ڕۆژهەڵات، گەلێك کۆمەڵگەی کۆن دۆزراوەتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ماوەکانی سەرەتای چاخی بەردینی کۆن وەکو (کەریم شایەر) لە کەرکوك، کە بە ناوبانگترین شوێنی ئەو ماوەیەیە کە لە دواییدا سەرەتاکانی دەرکەوتنی کشتوکاڵ تیادا بەدەرکەوتووە، بە دیاریکراوی لە کۆتاییەکانی چاخی بەردینی ناوەڕاست، لەگەڵ شوێنی زاوی چەمی - شانەدەر لە هەولێرو (ملفعات) لە موسڵ، هەموو بەڵگە شوێنەوارییەکان ئەوە دەخەنە ڕوو کە ئەم کۆمەڵگانە ماوەی گواستنەوەیە بۆ کاری کشتوکاڵی ڕاستەقینە لە گوندە جێگرەکان، لەم ناوچانە باری سروشتی ئاوو هەواو بارانو ئاژەڵی کێویو ڕووەکی سروشتیو مرۆڤی چاك، توانیوویانە کە هەستن بە ماڵیکردنی ئاژەڵو سوود بینین لێیان[١٠].

*** ڕۆڵی شارستانی ناوچەی کەرکوك لە ماوەی چاخی بەردینی ناوەڕاست:-**

چاخی بەردینی ناوەڕاست دادەنرێت بە چاخی بەردینی دووەم کە لە کۆتایی چاخی بەردینی کۆن دێت، کە جێگۆڕکێیە لەنێوان چاخی بەردینی کۆنو چاخی بەردینی نوێیە[١١].

بەهۆی گۆڕینی ئاووهەوا لە کۆتاییەکانی چاخی بەردینی کۆنو توانەوەی بەستەڵەکەکان لە بەشی سەرووی گۆی زەوی، مرۆڤ دەستی کرد بە چالاکی بە تایبەتی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی کۆن، بە بارێکی تر کە پێی دەوترێت چاخی بەردینی ناوەڕاست کە ناوەندە لەنێوان چاخی ڕاوکردن و کۆکردنەوەی ڕووەك[١٢].

بەرووبوومی کێویو سەردەمی کشتوکاڵو پەروەردەو ماڵیکردنی ئاژەڵ شێوازی گواستنەوەی مرۆڤ بۆ قۆناغێکی تازە کە هاوگونجاوە بە بازدان بۆ قۆناغێکی تر. دەورێکی گەورە دەبینێت لە گۆڕینی بەشێك لە جوانکارییەکانی ژیانی، ئەم ماوەیە لە کۆتایی چاخی بەستەڵەکی سەردەمی بلایستوسینی[١٣] ناسراوە. پێش نزیکەی دوانزە هەزار ساڵی ڕۆیشتوو، لە دوای توانەوەی بەستەڵەکەکان[١٤]. گەڕانەوە بۆ ئەو هێلە پانەی کە تاکو ئێستاکە وەکو خۆی ماوەتەوە.

لەدوای گۆڕینی ئاووهەوا، لەگەڵ خۆیدا بووە هەڵگری مام ناوەندی لە ئاو و هەوادا، مرۆڤ لە ئەشکەوت هاتە دەرەوە، کە لە ڕابردوودا تا ماوەیەکی چاك ژیانی تێدا گووزەری کردووە، لە دوایدا ڕۆیشتووە بۆ خۆگونجاندن لە شوێنی نیشتەجێ بوونی نوێیو مانەوەی بۆ ماوەیەکی کاتی کە هاوگونجاوی ئەو بارە لە بارە بێت بۆ گواستنەوەی نیشتەجێبوونێکی چەسپاو[١٥].

ئەو شوێنانەی کە مرۆڤی تێدا نیشتەجێ بوو لە شێوەی کۆمەڵگەی وەرزی دابووە لە شوێنێکی بەرکراوە لەسەر ڕۆخی ڕووبارو شوێنی سەرچاوەکانی ئاو[١٦].

ئەم گۆڕانکارییانە هاوگونجاو بووە بۆ بەدەست کەوتنی خواردن لە کاتی کارکردنی بە کشتوکاڵی درەختە کێوییەکانو ماڵیکردنی ئاژەڵەکان، بەڵام بە شێوەیەکی سەرەکی پشتی بە ڕاوو کۆکردنەوە بە ستۆتەوە بۆ بەردەوامی مانەوە[١٧]. کە ئابووری ئەو کاتە لە سەری بنیات نراوە[١٨].

گەلێك لە لێکۆڵینەوە شوێنەوارییەکان لە سەدەی ڕابردوو پاشماوەی ئەم سەردەمەیان دۆزیوەتەوە، کە درێژ دەبێتەوە لەنێوان (١٢٥٠٠- ١٠٠٠٠) ساڵ پێش زایینی، لەگەڵ شوێنی عێراق لە ناوچەکانی باکووری (کوردستان) لە شێوەی ئەشکەوت و مۆڵگەی چیایی لە گوندو کۆمەڵگاکان لەسەر زەوی بەرفراوان[١٩].

بەڵگەی پاشماوە شوێنەوارییەکان کە بە پشکینی کەرەستە فیزیاییە دۆزراوەکان ناسراوە، لە ڕێگای ئامرازی پشکنینی (کاربۆنی ١٤- C ١٤)، ئەوە دەخەنە ڕوو کە دەگەڕێتەوە بۆ (١١٠٠٠- ١٠٠٠٠) ساڵ پێش زانیی[٢٠].

بەناو بانگترین ئەو ئەشکەوتانە، ئەشکەوتی (زەرزی) لە سەرڕووی ڕۆژئاوای شاری سلێمانییەو ئەشکەوتی پاڵەگەورە لە ڕۆژهەڵاتی ناوچەی چەمچەماڵو چینی (B) لە ئەشکەوتی (شانەدەر) لە پارێزگای هەولێر[٢١].

بەڵام شوێنە بەربڵاوەکان بریتیە لە (زاوی چەمی) لە ڕۆژئاوای ئەشکەوتی (شانەدەر). شوێنی (کەریم شایەر) لە پارێزگای کەرکوك لە ڕۆژهەڵاتی ناوچەی چەمچەماڵو شوێنی (ملفعات) لەسەر ڕووباری (خازر) لەسەر ڕێگای نێوان (هەولێر - موسڵ)، گردچای لەسەر ڕۆخی چەپی ڕووباری زێی گەورە[٢٢].

دەتوانین بڵێن کە (کەریم شایەر) ڕەنگدانەوەی پێشکەوتنی ئەو شارستانییە کە چاخی بەردینی ناوەڕاست لە عێراق بە گشتیو کەرکوك بە تایبەتی بە خۆیەوە دیوە، نموونەیەکی بەرچاوە لە شارستانییەتی هەمان سەردەم، کە دەورێکی بەرچاوی بینیووە لە دەسکەوتەکانی شارستانی لە هەمان ئەو سەردەمانە، کە بوو بە دانانی یەکەم خشتی پێشکەوتنی ئەو شارستانییانەی کە لە چاخی بەردینی کۆنەوە سەری هەڵداو بەردەوام بوو لەوەو دوای. شوێنی (کەریم شایەر) شوێنێکی بەربڵاوە کە دەکەوێتە بەرزایی ئەو گردانەی لە سەرووی ڕۆژهەڵاتی عێراق بە دووری نۆ کیلۆ مەتر لە ڕۆژهەڵاتی شاری چەمچەماڵ و لە دووری حەفتاو پێنج کیلۆ مەتر لە سەرووی ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوك[٢٣] بووە.

پێوانەی ئەم شوێنە نزیکەی (٨٠٠٠) هەزار مەتر دووجایە، بەرزییەکەی نزیکەی (٨٣٥) مەترە، لەکاتی کنەوپشکنینو هەڵکۆڵین لەم شوێنە تەنها یەك ماوەی نیشتەجێ بوونی تێدا دۆزراوەتەوە، چینی ڕووکەشی ئەم ماوەیە، ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر گردەکەوە کە قوڵی لەنێوان (٢٥- ٣٠) سانتیمەترە، لەوانەیە مێژووەکەی بگەڕێتەوە بۆ هەزارەی نۆیەم یان دەیەمی پێش زایینی. لەلایەن لێکۆڵەری شوێنەواری (بروس هاو) لە ساڵی (١٩٥٠) هەڵکۆڵینی لەسەر کراوە[٢٤]. ئەوەی خستووەتە ڕوو ئەم شوێنە شوێنێکی نیشتەجێبوونی وەرزی بووە[٢٥].

(بروس هاو)لەو باوەڕەدایە که دانیشتووانی ئەم ناوچەیە وەکو هەموو ناوچەکانی تری هەمان شێوە، نیشتەجێبوونێکی نیمچە کاتی بووە کە لە ئەشکەوتەکانەوە هاتووچۆیان کردووە[٢٦]. دانیشتووانی (کەریم شایەر) سەرچاوەی خواردنیان لەسەر ڕاوو کۆکردنەوەی ڕووەك بووە، دانیشتووانی ئەم شوێنە ڕاوی مەری کێویو ئاسکەو بەرازی کێویان کردووە، لە پاڵ گەلێك ئاژەڵی کێوی تری وەکو ئاسکەی سوورو ڕێویو گورگ[٢٧].

گەلێك ئێسکی ئەم ئاژەڵانە دۆزراونەتەوە، دەرکەوتووە (٥٠٪)ی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جۆرانەی کە ماڵی بوونە، مرۆڤ دەستەمۆی کردووە لەبەر هۆکاری ئابووری، هەوڵدانێکی سەرەتا پێش هەبووە بۆ ماڵیکردنیان[٢٨].

هەرچەندە ماڵیکردن لەم شوێنە تۆمار نەکراوە، بەڵام توانراوە کە ڕێژەی ئەو ئێسکی ئاژەڵانە بدۆزێتەوە کە لە دوایدا ماڵی کراوە[٢٩].

هەروەها دانیشتووان هەستاون بە کۆکردنەوەی ڕووەك، گەلێك کەرەستەی کشتوکاڵی وەکو داسو هاوەنو دەستاڕ

کە دروستکراوە لە بەردی داتاشراو دۆزراوەتەوە[٣٠].

هەندێك لە دۆزراوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە گوایە بەشێك لەو کەرەستانەی کە دانیشتووان بەکاریان هێناوە بۆ کاری کشتوکاڵی لە قۆناغی تاقیکردنەوەی سنوور داربووە[٣١].

لەلایەکی ترەوە دۆزراوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە گوایە دانیشتووان بەم کەرەستانە کاریان لە جۆرێك پیشەسازی کردووە کە لە پاڵ ئەو کەرەستانەی ئاماژەمان پێکرد، گەلێك کەرەستەی تری وەکو:- تیغ، نووکە ئەستی، ئەزامیل، کونکەرە، ڕووشانی بەردی‌و کەرەستەی مایکرۆلیسیە (بریتییە لەو کەرەستە ووردکارییە بچووك‌و دروستکراوانەی کەلە سەردەمی چاخی بەردینی ناوەڕاست باوی هەبووە).

جۆرێك لە کەرەستەی تر دۆزراوەتەوە لە شێوەی میرووجوانکاری تایبەتی وەکو:- بازنگ‌و هەڵقەی پەنجەو دەلالی بەردینی کە بەشێکی لە ئێسك‌و میروو دروستکراوە، لە پاڵ دۆزینەوەی دووجۆرە بووکەڵەی قووڕی، کە بەڵگەیە بۆ سەلماندنی ژیانی دانیشتووان لەو سەردەمەو ڕۆڵی ژینگەیی گەورە، دەوری بەرچاوی بینیووە لە ژیان لە ئەشکەوت‌و لە ژیانی ئاسوودەو جێگر لە گوندە بەردەوامەکان، کە ئەم هەنگاوە لە چاخی بەردینی نوێ دەوری بینی[٣٢].

*** ڕۆڵی شارستانی دەڤەری کەرکوك لە ماوەی چاخی بەردینی نوێدا:-**

پێناسەی چاخی بەردینی نوێ بە شۆڕشی کشتوکاڵی یان سەرەتای بەرهەم هێنان دادەنرێت، مرۆڤ بوو بە بەرهەمهێن، کە لە ڕابردوودا بە کاربەر بووە[٣٣].

گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی لە ژیانی مرۆڤ ڕوویاندا کە گۆڕینی ژیانی ڕاووشکاروکۆکردنەوەی خۆراك بوو بەشێوەیەکی بەرە.. بەرە، لە هەموو شوێنێك‌و بەشێك لە جیهان[٣٤].

نیشتەجێ بوون لەئەشکەوت‌و شوێنی بەربلاو لە هەر دوو چاخی کۆن‌و چاخی ناوەڕاست‌و هەنگاونان بەرەو ژیانی کشتوکاڵ‌و ماڵیکردنی ئاژەڵ‌و ئاسوودە بوون‌و کۆبوونەوە لە کۆمەڵگە کشتوکاڵییە جێگرییەکان[٣٥].

ئەم گۆڕانکارییە هەزاران ساڵی خایاندووە، بەهۆی گۆڕینی بەرە بەرەی ئاوو هەواو ژینگەو سرووشت، کە ڕەنگدانەوەی هەبووە لەسەر ئاسوودەی مرۆڤ‌و بیرکردنەوەی داهێنانی پێشکەوتوو بۆ چاکترکردنی بوارەکانی ژیانی[٣٦].

دەتوانین بڵێین لایەنی ئاووهەوا یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکانی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی کۆن، بوو بەهۆی ڕوودانی (شۆڕشی کشتوکاڵی)، کە ئەم ناوچەیە سەر پێشخەری ئەم شۆڕشە بوو لە ناوەڕاستی هەزارەی نۆیەمی پێش زاینی[٣٧].

ئەم ناوچەیە ماوەیەك تووشی ووشکە ساڵی ڕێژەیی بوو کە ناوچەکانی خوارووی گۆی زەوی گرتەوە، ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆنیش بەشێك بوو لێی، لەدوای چاخی بەستەڵەکی چوارەم (وورم) کاریگەری هەبوو لەسەرکەمی بارینی باران‌و لە دوایدا کاریگەریی نەرێنی خستەوە لەسەر پانتایی ڕووەکی‌و جۆری ئاژەڵەکان کە لەنێو ئەو ژینگەیەدا دەژیان. ئەم ووشکە ساڵییەش خۆی لە خۆیدا بووە کەم بوونی سەرچاوەکانی ژیان، کە مرۆڤ پشتی پێ دەبەست، بۆیە بۆ بەدەست هێنانی سەرچاوەکانی خۆراك، کۆچکردن بۆ ئەو ناوچانەی کە کەمتر ووشکە ساڵی لێ هەبوو، سەرچاوەی ئاوو کشتوکاڵ‌و ئاژەڵی لێ دەست دەکەوت[٣٨].

ناوچەی ڕۆژهەڵاتی کۆن چەقی سەرەکی چاخی بەردینی نوێ‌و پێشکەوتنەکانی بوو، کۆنترین ناوچە بووە کە پێشکەوتنی کشتوکاڵ‌و بەخێوکردنی ئاژەڵی تێدا سەر هەڵداوە لەبەر باری ژینگەیی‌و سروشتی هاوگونجاوی تێدا گەلێك جۆری خۆرسکی وەکو گەنم‌و جۆ بە شێوەیەکی سروشتی لەو دەشت‌و دەرە گەشەیان کردووە، کە پێگەشتنی سەرەتاکانی کشتوکاڵی تێدا هەبووە، هەروەها بەشێکی زۆر لە جۆرەکانی ئاژەڵی کێوی تێدا گەشەی کردووەو دەستەمۆ بوو لەو ماوەیەدا وەکو سەگ‌و بزن‌و مەڕومالات‌و بەراز[٣٩].

ناوچە بەرزە چیایی‌و گردە تەختەکان‌و ناوچەی ڕۆخەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست، یەکێکە لەو ناوچانەی ڕۆژهەڵاتی کۆن لەسەردەمی چاخی بەردینی نوێ، کە دۆخێکی لەباری کشتوکاڵی‌و بەخێوکردن‌و هاوگونجاوی ئاو هەواو و ڕێژەی باران بارینی پێویست دەوری هەبووە لەپێگەیاندنی کشتوکاڵ‌و ئاودێری‌و چالاکی گەورەی مرۆڤی[٤٠].

لەعێراقیش لە ناوچەی سەرووی پێشەنگی یەکەم گوندی کشتوکاڵییە، کە دانیشتووانی ئەم شوێنانە ئەرکی کشتوکاڵی‌و ماڵیکردنیان لە ئەستۆ گرتووە، کە بە قۆناغ ئەم ژینگەیە گەلێك درەخت‌و ئاژەڵی تێدا پێگەیشتووە کە بووەتە هۆی دەرکەوتنی سەرەتاکانی شۆڕشی کشتوکاڵی[٤١].

ناوچە بەرزییەکانی گردەکانی سەرووی ڕۆژهەڵاتی، پێشەنگی پێشکەوتنی شارستانی چاخی بەردینی نوێیە، کە ناوچەی کەرکوك دەورێکی گەورەی هەیە چالاکە لە پێشکەوتنی ئەم چاخە، کە هاوگونجاوە بەسەرهەڵدانی گوندی کشتوکاڵی‌و بەدەستهێنانی گەلێك دەسکەوتنی شارستانی کە بناغەی یەکەم خشتی داهێنانە لە عێراق بە شێوەیەکی تایبەتی‌و ناوچەی ڕۆژهەڵاتی کۆن بە شێوەیەکی گشتی.

گوندی (چەرموو) بەناوبانگترینە لە گوندەکانی ناوچەی کەرکوك‌و عێراق‌و ناوچەکە بە شێوەیەکی گشتی، ئەو کنەوپشکنین‌و هەڵکۆڵینانەی کە لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوو دۆزراونەتەوە ڕەنگدانەوەی بەشێکی گرنگی پێشکەوتنی شارستانییە لە هەموو بوارەکانداو لەلایەنەکانی ژیانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی چەرموو دادەنرێت بە کۆنترین‌و گرنگترین گوندی کشتوکاڵی لە عێراق‌و ڕۆژئاوای ئاسیا لە ماوەی چاخی بەردینی نوێ[٤٢].

(چەرموو) دەکەوێتە ناوچەیەکی دەشتی فراوان، لە دووری یانزە کیلۆمەتر لە شاری چەمچەماڵ‌و هەشت کیلۆمەتر لە خوارووی ڕۆژئاوای (کەریم شایەر)‌و بە دووری سی‌و پێنج کیلۆمەتر لە ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوك.

پێوانەی شوێنەکەی (١٤٠٠) کیلۆمەتر دووجایە[٤٣].

بیست و سێ پێ بەرزە لە دەشتاییەكانی دەوروبەری[٤٤].

بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوارو كەلەپووری عێراق پاشماوەكانی چەرمووی لە سەرەتاكانی چلەكانی سەدەی رابردوو دۆزیوەتەوە[٤٥]. لەدوایدا دەستەیەكی نێردراوی پەیمانگای رۆژهەلاتی سەر بە زانكۆی (شیكاگۆ)ی ئەمریكی بەسەرۆكایەتی (بریدوود) لە مایسی سالی (١٩٤٨) تا مایسی سالی (١٩٥٥)[٤٦]. توانی شانزە چینی شوێنەواری بدۆزنەوە كە پێنج چینی یەكەمی رێژەیەكی زۆر لە گۆزە دۆزراوەتەوە، یانزە چینەكەی تر بێ بەشە لە گۆزە[٤٧].

بۆیە ئەم ناوچەیە بەناوبانگە بە قۆناغی گوندی كە ژمارەیەكی زۆر جووتیاری تێدا ژیاوە لە پێش سەرهەلدانی سوالەت و گۆزە (per pottery Neolithic) بەمانای سەرەتای پێشكەوتنی گوندە[٤٨].

لەسەر ئەم بنچینەیە لێكۆلەران دووماوەی مێژوویيان لە چاخی بەردینی نوێ دیاری كردووە، ماوەیەكی پێش سەرهەلدانی گۆزەو ماوەیەكی تری دوای سەرهەلدانی گۆزەو گۆزەكاری[٤٩].

گۆزەی (چەرموو) بەناوبانگەبەوەی ناشرینەو دیوارەكەی بێ هێزە لەبەر ئەوەی لە پلەیەكی گەرمی كەم ووشك كراوە تەوەو بەجوانی قوورەكەی نەشێلراوە و بێ رەنگە، تەنها هەندێك گۆزەی نەبێت لە چینەكانی چوارو پێنج كەرازاوەتەوە بە هێلی یەكتر بر بە رەنگی رەش و سوور[٥٠].

پیشەی گۆزەكاری دادەنرێت بە بەناوبانگترین پیشەسازی سەرەكی لە قۆناغی كاری كشتوكالی و مالیكردنی ئاژەل و نیشتەجێ بوون لە گوندە كشتوكالییەكان[٥١].

دەتوانین مێژووی ئەم گوندە بەرێگای كاربۆن ١٤ (C . ١٤) بەنزیكەی (٦٧٥٠) پێش زاینی دابنرێت[٥٢].

كە ماوەی دیاری كراوی نیشتەجێ بوو لەو شوێنە بە نزیكەی (٤٠٠- ٥٠٠)سال دەگەرێتەوە[٥٣]. لە گرنگترین ئەو بەشانەی كە لەو گوندەدا دۆزراوەتەوە بۆ فراوانكردنی كارەكانی كشتوكالی، ئەویش دۆزینەوەی دانەوێلەی بە غەلوزبووە لە شێوەی مالی لە جۆری گەنم و جۆ، لەگەل دۆزینەوەی گەنمی تێكەل لە جۆری (Einkorn. Emmer) لەگەل پاشماوەی جۆی مالی كە گولەكەی لە دووریزی دانەوێلەیە نزیكە لە جۆری جۆی كێوی بە ناوی (H. spontaneum) بەلام جیاوازە لە گەورەیی دانەوێلەكەو رەقی لقەكەی.

گوندی چەرموو دادەنرێت بە باشترین شوێن لە ناوچەكانی كۆن كە بەناوبانگە بەرووداني كشتوكالی دانەوێلە، كە مالیكردنی پرۆسەی دانەوێلە لە شێوەیەكی تایبەت و زۆر پێش كەرتووە بووە لەو ناوچەیە[٥٥].

بێجگە لە دانەوێلە، گەلێك پاشماوەی بەرهەمی هەندێك درەختی وەكو بەروو، فستق دۆزراوەتەوە وەكو ئەوەی كە دانیشتووان كۆیان كردووەتەوە بۆ سوود وەرگرتن لە پێكهاتە رۆنییەكانی[٥٦].

هەروەها لەگەل دۆزینەوەی پاشماوەی تۆوی غەلووزی هەندێك رووەك وەكو:- نیسك و نۆك و بەزالیا و ماشی شین، لێكۆلینەوەكان ئەوەیان بەدەرخستووە كە ئەم بەروو بوومانە لەلایەن دانیشتووانی گوندەكەوە بەكارهاتووە وەكو مادەیەكی خۆراكی گرنگ[٥٧].

لەهەمان كاتدا دانیشتووانی گوندە كە هەستاون بەمالیكردنی هەندێك ئاژەل كە سوودی ئابووری خۆی هەیە، ئەویش لە پای ئەو ئێسكانەی كە دۆزراوەتەوە وەكو:- بزن كە رێژەیەكی زۆر ئێسكی دۆزراوەتەوە لە چینەكانی ژێرەوە، پێش سەرهەلدانی گۆزەكارییە لە مێژووی گوندەكە[٥٨]. لەگەل ئێسكی ئەو مەرانەی كە لە چینەكانی ژێرەوەی گوندەكە دۆزراونەتەوە[٥٩]. هەروەها رێژەی (١٠٪)ی ئێسكی بەراز لە رێژەی ئێسكی ئاژەلەكانی گوندەكە كە مالی كراوە، لە چینەكانی ژێرەوە دۆزراوەتەوە[٦٠].

هەروەها ئێسكی سەگ و بەرازو كەروێشك و مەرو مالات و گورگ و رێوی كێوی و هەندێك لە جۆرەكانی بالندە دۆزراوەتەوە[٦١]. لەگەل دۆزینەوەی رێژەیەكی زۆری گوێچكە ماسی، لە رابردوودا بەشێكی گرنگی خۆراكی دانیشتووان بووە[٦٢].

دانیشتووانی ئەم گوندە كاری پیشەسازییان كردووە، لە ماوەی دۆزینەوەی گەلێك كەرەستەی جۆراوجۆری ئەستێی و ئەوبسیدی كە لە ولاتی ئەنادۆلەوە هێناویان[٦٣].

لەو كەرەستانەی كە دۆزراوەتەوە:- دەفری بەردی و مەدەگی بەردی دەرگاو[٦٤]. مێكووت و هاوەن و دەستار، كە بۆ كووتان و ووردكردنی دانەوێلە بەكارهاتووە، لەگەل بەكارهێنانی چەقۆو داسی ئەستێ كە دەسكەكەی بە رێگا قیرەوە چەسپ كراوە، بۆ دروێنە سوودی لێبینراوە، لەگەل بەكارهێنانی كەرەستەی مایكرۆلیسیەو كونكەرو نووكی تیری شێوە قرنجاو (رووشاو)[٦٥].

دۆزینەوەی رستنی ئەستێی بەلگەیە بۆ ئەوەی كە دانیشتیووانی گوندەكە رستن و چنینیان بە خوری و كەتان زانیبێت[٦٦].

هەروەها كەرەستەی جوانكاری رازاندنەوە دۆزراوەتەوە كە دروستكراوە لەبەردو ئێسك و مولانكەی دروستكراو لە میرۆئونگستیلەو دەلالیات و بازنگ، كە نزیكەی (٢٢٥) پارچەی لە گوندەكە لێ دۆزراوەتەوە[٦٧]. هەروەها كەوچك و دەرزی دروستكراو لە ئێسك دۆزراوەتەوە[٦٨].

گرنگترین شت كە لە گوندەكە لێ دۆزراوەتەوە، بووكەلەی قووریینی بچكۆلەیە لەسەر شێوەی ئاژەل و ئافرەتی رووت لەسەر باری سك پری، كەنزیكەی (٥٠٠) بوكەلە دۆزراوەتەوە، سوورەوە كردنێكی سادەو شێلانێكی كەم و بەشێكیان رەنگی سوورە كە بە ناوبانگە بە بووكەلەی دایك[٦٩].

ئەم بووكەلانە ئاماژەیە بە پیرۆزی زۆر بوون و مندال هێنان و سروشت، ئەمیش جۆرێك بووە لە بیروباوەڕو سرووت لە چوار چێوەی ئاینی كە دەسوورێتەوە لە خولگەی زۆربوون و بەرهەم هێنان كە خەلكەكەی گوندی (چەرموو) بەشێوەیەكی تایبەتی و گوندە عێراقییەكانی تر بە شێوەكی گشتی باوەڕیان پێی هەبووە، چونكە زۆربەی ئەم گوندە كشتوكالییانە بەرهەمەكانیان پشتی بە باران بەستووە بۆ زۆر بوون، لەبەر ئەمە دانیشتووانی (چەرموو) یەكەم گوند بوو پشتیان پێی بەستووەو پیرۆز بووە لایان بۆیە ئەم

بووکەڵانەیان پەرستووە بە خوداوەندی دایکیان زانیووە لەبەر ئەوەی سەرچاوەی سەرەکی ژیان بووە لەلایەن هەموو ڕەچەکی مرۆڤایەتی[٧٠].

لەنێوان ئەو شتانەی کە لەم گوندە دۆزراوەتەوە، بەشێکی گرنگی شارستانیە لە پێشکەوتنی بەرەو نیشتەجێ بوون لەگوندە جێگرەکان، ئەویش دۆزرینەوەی ژمارەیەك خانووی نیشتەجێ بوون کە مەزەندە دەکرێت لەنێوان (٢٠-٣٠) خانووکە ژمارەی دانیشتووانی نزیکەی (١٥٠) کەس بووە، لەسەرشێوەی لاکێشەیی، دروستکراوە لەسەر بنەڕەتی بەردو دیوارەکەی کەفماڵ کراوە، زەوی ماڵەکان بە قامیش‌و سەر خانووەکانیش بە قامیش قامیش ڕێژکراوە[٧١]. هەروەها ژمارەیەك ژووری بچووکی تێدایە کە درێژی هەندێکیان (٥-٦) مەترە[٧٢].

گوندی چەرموو گرنگترین چەقی پەیوەندی کاریگەری ئابووری‌و کۆمەڵایەتی عێراق بە شێوەیەکی گشتی لە ماوەی چاخی بەردینی نوێ لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەری، کە ڕەنگدانەوەیەکی گرنگە لە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی‌و هاتووچۆو پەیوەندی کردن کە دانیشتووانی عێراقی کۆن بە یەکەوە، لە ڕابردوودا گوندی چەرموو دەورێکی سەرەکی‌و گرنگیان بینیووە بەوەی دانیشتووانی گوندەکە هەستاون بە هاتنی ئەوبسیدیان لە ناوەڕاستی وڵاتی (ئەنادۆڵ)و گۆماوی (وان)و هەندێك لە ناوچەکانی ئەرمینیا بە تایبەتی لە بەشێکی ئەنادۆڵ[٧٣].

کە سەرچاوەیەکی سەرەکی بووەو ئەم گوندە نزیکترین شوێن بووە لە ناوچەی کەوانەی بەپیت‌و بەبەرەکەتی، هەندێك لە بەڵگەکان ئەوە دەخەنە ڕوو، کە دانیشتووانی چەرموو بازرگانی سەرکەوتوویان کردووە لە ڕێگای ناوچە چیاییەکان پێش (٦٠٠٠) هەزار ساڵ پێش زایینی کە ناوچەکەیان بێ بەش بووە بەم کەرەستەیە بۆیە هەنگاویان ناوە بەرەو سەرووی ئەم ناوچانە لە ئەنادۆڵ سەرووی ئەرمینیا[٧٤].

ئەمیش بەڵگەیەکی باشە لە پەیوەندی بازرگانی یان لەوانەیە کۆمەڵایەتی لەنێوان ئەم گوندەو دانیشتووانی. پیشەسازی بەردی ئۆبیدیان نزیکەی (٤٠٪)ی کۆی گشتی پیشەسازی بەردی ئەم گوندە پێکدەهێنێت[٧٥].

لەو کاریگەرییە کۆمەڵایەتییانەی لەنێوان دانیشتووانی گوندی چەرموو لەگەڵ گوندە کشتوکاڵییەکانی تری عێراق هەیە دۆزینەوەی وەکو ئەوەی شێوەی خوداوەندی دایکە لە گەلێك لە گوندەکانی عێراق‌و گوندەکانی دەوروبەری وەکو گوندی (چاتال هویوك) کە یەکێکە لە گوندە بەرچاوەکانی چاخی بەردینی نوێ لەوڵاتی ئەنادۆڵ کە گەلێك پەیوەندی‌و کاریگەری ئابووری‌و کۆمەڵایەتی گەورە لەگەڵ گوندی چەرموو بە یەکیان دەبەستێتەوە لە شێوازی پیشەسازی جۆری کەرەستەی دروستکراوکە تا ڕادەیەکی چاك هاوشێوەی لەنێوان ئەو دوو گوندە دا هەیە[٧٦].

لەنێوان ئەو گوندانەی کە دەورێکی شارستانی بینی لە ناوچەی کەرکوك لە ماوەی چاخی بەردینی نوێ ئەویش گوندی (مەتارە) کە پاشماوەی لەسەر یەکێك لە گردی گوندەکە دۆزراوەتەوە بە ناوی (قرە یتیخ)، کە (٤) کیلۆ مەتر لە گوندەکەوە دوورە بە دووری (٣٥) کیلۆ مەتر لە خوارووی شاری کەرکوك، کە پاشماوەی کشتوکاڵی سەرەتایی لێ دۆزراوەتەوە[٧٧].

بەرزی گردەکە (٨) مەترەو پانتایی-(٢٠٠) مەترو بە بەرزی (٧٥٠) لەسەر ئاستی دەریاوە مێژووی گوندەکە بەپێی تاقیگەی کاربۆن (C ١٤ – ١٤)ی تیشکی بۆ نزیکەی (٧٥٧٠ ⁺ ٢٥٠) پێش زایینی دەگەڕێتەوە[٧٨].

لە شوێنی گوندەکە نێردراوێکی شوێنەواری ئەمریکی کنەو پشکنینی کردووە لە پەیمانگای ڕۆژهەڵاتی لە زانکۆی شیکاغۆ بە سەرۆکایەتی (ڕۆبەرت بریدوود. Brid wood R .) ئەم نێردەیە توانی (٥) چینی خانوو بدۆزنەوە، هەروەها گەلێك پارچە گۆزە هاوشێوەی حەسوونەو سامەڕرا بدۆزنەوە لەگەڵ دۆزینەوەی جەرەو دەفری‌و پارچەی ئێسکی کە لە شێوەی دەرزییە لەوانەیە بەکار هاتبێت بۆ دوورمان‌و شانە لەگەڵ خەپکەی قووری کە لەوانەیە بۆرستن بەکارهاتبێت، لەگەڵ لاشەی ئێسکی‌و کەلەسەری مرۆڤ[٧٩]. هەروەها کەرەستەی دروستکراو لە ئۆبستیدیان دۆزراوەتەوە لە شێوەی شفرە و پارچەی مایکرۆلیسییە[٨٠]، کە بەڵگەیە لە دەورەوەی ناوچەکەوە هێنرابێت.

هەروەها گەلێك کەرەستەی بەردی وەکو هاوەن‌و مێکوت‌و جۆرەها لە بەردی هارین‌و پاچ‌و ئەزابیل، لەگەڵ کەرەستەی جوانکاری دۆزراوەتەوە کەلە بەردو سەدەف‌و ئێسك دروستکراوە. لەگەڵ دۆزینەوەی بووکەڵەی شێواو کە لە شێوەی خوداوەندە دایك‌و پارچەی بووکەڵەی ئاژەڵی، دانیشتووانی ئەم گوندە لە خانووی لاکێشەیی ژیاون کە لە قوور دروستکراوە کە ژووری زۆری هەبووە[٨١]. کە بەشێکی لێ دۆزراوەتەوە، بەشێکی بەخشت‌و بەشێکی بە قوور دروستکراوە[٨٢].


* سەرچاوەو پەراوێزەکان:-

١- الدباغ، تقي، البيئة الطبيعية والانسان، في حضارة العراق، ج١، بغداد، ١٩٨٨، لاپەڕە ٣٠- ٣١.

٢- الجاسم، صباح عبود، مرحلة الانتقال من جمع القوت إلى انتاج القوت في العراق وغرب آسيا، نامەی ماستەر بڵاونەبۆتەوە کۆلێژی ئەداب، زانکۆی بەغدا، ١٩٧٥ لاپەڕە ٢٦.

٣- الدباغ" البيئة الطبيعية والانسان: المصدر السابق،

لاپەرە ٢٦.

-٤Kuhrt. A. the Ancient Near East c٣٣٠٠-٣٠٠٠ B.C.Vol. ١ London ٢٠٠٢ p. ١٣.

Reed. C. A. A RevieW of The Archaeological-٥ Evidence of Animal Domestications. In Iraqi Kurdistan Chicago ١٩٦٠ p. ١٣٥.

٦- بەرزاییە گردییەکانی کەوانەی بەپیت:- ئەم زاراوەیە لێکۆڵەری شوێنەواری (رۆبرت بریدوود) بەکاریهێناوە، لەسەر ئەو بەرزاییە گردییانەی کە لە شێوەی کەوانەی بە تەنیشتی چیای زاگرۆس عێراق و ئێران وناوچە رۆخییەکانی رۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەراست بروانە.

Reed. OP. Cit P. ٩.-٧

Ibid. P. ١٨٣.-٨

Braid wood – Howe OP.Cit P. ١٤٦.-٩

١٠- الدباغ، تقي: الثورة الزراعية والقري الاولي في الحضارة العراق، ج١ بغداد ١٩٨٨، لاپەرە (١١٨).

١١- باقر، طه مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة، ج١، بغداد، ١٩٨٣، لاپەرە (١٨٣).

١٢- الدباغ، تقي الوطن العربي في العصور الحجرية، بغداد، ١٩٧٣ لاپەرە (٨١).

١٣- چاخی بلایستوسین .Pleistocene Epochچاخی دواییە لەم ژیانەی ئێستامان (Cenozioc. Era) کە درێژ دەبێتەوە لە نزیکەی (٦٣) ملیۆن ساڵ تا ئەم سەردەمەی ئێستامان، کەزۆر لە لێکۆرەکان بە درێژەوە بووی ئەم سەردەمەی دادەنێن، هەندێك تریش پێی دەڵێن (هۆلۆسین Holocene) کە نزیکەی ملیۆن ساڵی خایاندووە، ئەم ماوەیە دادەنرێت بە گرنگترینیان لەلایەن جیۆلۆجیی و جوگرافی و پێشکەوتنی مرۆڤ، وە ناوێکی تر بەم سەردەمە دەوترێت کە سەردەمی بەستەڵەکە (IceAge) بەشێك لە لێکۆڵەران ئەم سەردەمە بە چوار ماوەی بەستەڵەکی دادەنێن هەندێکێش بە قۆناغ یان ماوەی گەرمی، کە ماوەکانیش بە ناوی دۆڵ و چیای ئەلب ناونراوە:-

ماوەی بەستەڵەکی (کنز – Gunz).

ماوەی بەستەڵەکەی (مندل – Mindle).

ماوەی بەستەڵەکی (رس – Riss).

ماوەی بەستەڵەکی (وورم – Wurm).

بروانە:-

- الدباغ، تقي – الجادر، وليد، عصور ماقبل التأريخ، بغداد، ١٩٨٣، لاپەرە (١٧).

- الصائغ، عبدالهادي يحيى – العمري، فاروق صنع الله، الجيولوجيا العام، الموصل، ١٩٩٩، لاپەرە (٣٦١- ٣٦٢).

Watkins. T. centres and Peripheries.The-١٤ Beginning of Sedentery Communities in N. Mesopotamia In Subartu Vol ١n Berpols ١٩٩٨. P . ١.

Nissen H. J. The EarlY HiStorY of the-١٥ Ancient Near East ٩٠٠٠- ٢٠٠٠ B. C. Chicago. ١٩٨٨. P.P ١٦- ١٧.

١٦- الأعظمي، محمد طه محمد، الاسوارو التحصينات الدفاعية في الدفاعية في العمارة العراقية القديمة، اطروحة دكتوارة غير منشورة، كلية الآداب، جامعة بغداد، ١٩٩٢، ص٢.

١٧- الدباغ، الثورة الزراعية" المصدر السابق، ص ١١١. بروانە النجم، حسين يوسف حازم، إقتصاد القري الزراعية خلال العصرين الحجريين الحديث والمعدني في العراق، اطروحة دكتوراه غير منشورة، كلية الآداب، جامعة الموصل، ٢٠٠٦، لاپەرە (٢٩).

١٨- الجاسم، المصدر السابق، لاپەرە ٧٢.

١٩- الدباغ، الوطن العربي، المصدر السابق، لاپەرە ٨٥.

٢٠- باقر، المصدر السابق، ص ٨٥.

٢١- لەسەر ئەم ئەشکەوتانە بروانە:

Solecki R. Shanidar Cave APalaeolithic Site In Northern Iraq and Its Relationship to the stoe Age Sequence of Iraq Sumer Vol ١١. ١٩٥٥. Pp. ٢٠- ٢٢

لەسەر ئەم شوێنانە بروانە:-

٢٢- حول تلك المواقع ينظر:-

٥٥. Also See.-Braid wood – Howe op cit p.p ٥٠ Mellaart. J. Earliest Settlements in western Asia From The Ninth To The End of the Fife In Millennium B. C. In: The Cambrifge Ancient ١٩٧٠ p.p ٢٥٤- ٢٥٧. History . Vol. ١

Finegan. J. Archaeological. History of The -٢٣ Ancient Middle East. united states of America. ١٩٧٩. P٣. Also See: Mellaart. Op. cit. ٢٥٧.

Charvat. P. Mesoptamia Before History. -٢٤ London . ٢٠٠٢. P٧.

Also See: Braid wood – Howe op cit pp: ٥٢- ٥٤.

Charvat Op. cit .p. ٧. -٢٥

٢٦- الرويشدي، سعدي، نظرة في عملية تدجين النبات والحيوان، مجلة سومر، ج ٢٩، ١٩٧٣، لاپەرە ٤.

Charvat. Op. cit. ٧. -٢٧

٢٨- الدباغ، الوطن العربي، المصدر السابق، لاپەرە ٨٦.

Mellaart. Op. cit. p ٧. -٢٩

Charvat. Op. cit p. ٧. -٣٠

٣١- الدباغ، الوطن العربي، المصدر السابق، لاپەرە ٨٦.

Charvat. Op. cit. p.٧. -٣٢

٣٣- الدباغ، الوطن العربي، المصدر السابق، لاپەرە ١٠١.

Smith. B. C Low- Levei Food Production -٣٤ ١./In: Journal of Archaeological Research ٩ ٢٠٠١. Pp. ١- ٤٣.

Braidwood . R. J The Early Village In -٣٥ South Western Asia In Journal of NearEastern Studies Chicago Vol. ٣٢. ١٩٧٣. P. ٣٩.

٣٦- النجم، بروانە سەرچاوەی پێشوو. لاپەرە ٣١.

٣٧- بروانە سەرچاوەی پێشوو. لاپەرە ٣٢.

٣٨- Herbert. E. – wright. Jr. Climmate and Prehistoric Man in the Eastern Mediterranean. In: Prehistoric Investigations In Iraq Kurdistan op. cit p. ٧١.
هەروەها بڕوانە النجم لاپەرە ٣١.
٣٩- كول، سونيا، ثورة العصر الحجري الحديث، ترجمة: تقي الدباغ- نادية سعدي البوني، بغداد، ١٩٨٩، لاپەرە ٥.
٤٠- Kuhrt A. The Ancient Near East London ٢٠٠٢ pp ١٢- ١٣.
٤١- ابو الصوف، بهنام، اعالي مابين النهرين تشهد نواة اول ثورة زراعية في التأريخ. مجلة بين النهرين، ع١، ١٩٧٣، ص ٨-٩.
٤٢- Braidwood R Jarmo: Avllage of Early Farmers In Antiquity . Vol ٢٤. ١٨٩. From Internate.
٤٣- Finegan. Op. cit p. ٣.
بڕوانە الدباغ، الثورة الزراعية، المصدر السابق، لاپەرە ١٢١.
٤٤- الدباغ، الوطن العربي، المصدر السابق، لاثقرة ١١٤.
٤٥- Erickson Ch Jarmo The Oxford Encycpeopedia of Archaeology In The Near East. ١٩٩٧.
www. Maxpages. Com.
٤٦- صالح، قحطان رشيد، الكشاف الاثري في العراق، بغداد، ١٩٨٧، لاپەرە ٧٦.
٤٧- Nissen H. J. The Early History of The Ancient Near East ٩٠٠٠- ٢٠٠٠ B. C. Chicago. ١٩٨٨. P. ٢٧.
٤٨- الدباغ، الوطن العربي، المصدر السابق، لاثقرة ١١٤.
٤٩- Moore. A. M. The Neolithic of The Levant Oxford ١٩٧٨ From Internate.
٥٠- Braidwood – Howe op cit. p.٤٤.
٥١- Jawad A The Advent of the Era of Townships In Northern Mesopotamia In Archive Orientalni Vol ٣٦. Prag ١٩٦٨ p. ٤٩١.
٥٢- Mellaart. Op. cit. ٢٥٧.
٥٣- Finegan. op. cit. ٢٥٧.
Emmer:
جۆرێکە لە گەنمی سەرەتایی ئۆراسیە گوڵەکەی چوار ڕیزە لە دەنکی حەوت (کرۆمۆسۆمات) بڕوانە:- ڕایت، ا... ح، البيئة الطبيعية البدايات مرحلة إنتاج الغذاء في شمال مابين النهرين، وەرگێڕانی:- فوئاد حەمە خورشید، گۆڤاری کۆلیژی ئاداب، زانکۆی بەغدا، ژمارە (٦٤)، ساڵی (٢٠٠٣) لاپەرە (١٤٤).
Einkorn.
جۆرێکە لە گەنمی سەرەتایی کە لە ناوچە ووشکاییەکان دەڕوێت کە گوڵەکەی دووریزە لەو دانەوێڵانەیە کە حەوت (کرۆمۆسومات)ی هەیە. بڕوانە: ڕایت، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٤٦).
٥٤- Helback H. . The Paleothnobotany of The Near East and Europe. In. prehistoric Investigation In Iraqi Kurdistan. op. cit. p. ١٠٣.
٥٥- الرويشدى، المصدر السابق، لاپەرە ٥٨.
٥٦- Mellaart. op. cit. p٢٥٧.
٥٧- Ibid. p. ٢٥٧.
٥٨- المصدر نفسه، لاپەرە ٦٦.
٥٩- Berger. R. Protsch. R. The Domestication of Plants and Animals In Europe and The Near East. In Orientalia. Roma. Vol ٤٢. ١٩٣٧. p. ٢٢١.
٦٠- Ibid. p. ٢٢١.
٦١- Charvat. op. cit. p. ٢٥٧.
٦٢- الدباغ، الوطن العربي، المصدر السابق، لاثقرة ١١٥.
٦٣- Mellaart. op. cit. p. ٢٥٧.
٦٤- الدباغ، الثورة الزراعية، المصدر السابق، لاثقرة ١٢٣.
٦٥- Charvat. op. cit. p. ٢٥٧.
٦٦- Braidwood. op. cit. .
٦٧- Charvat. op. cit. p. ١٣.
Also: See: Mellaart. op. cit. p. ٢٥٧.
٦٨- Braidwood. op. cit.
٦٩- Cauvin. The Birth of The Gods and the Origins of Agriculture. Translated By: Trevor Watkins. Cambridge. ٢٠٠٣. pp: ٢٩- ٣١.
٧٠- Cauvin. op. cit. pp: ٢٩- ٣١.
٧١- Mellaart. op. cit. p. ٢٥٧.
٧٢- Braidwood. op. cit.
٧٣- Wright. H.. Obsidian Analyses and Prehistoric Near Eastern Trade: ٧٥٠٠ To ٣٥٠٠B. C. In Archive Orientalni. Vol. ٤٣. ١٩٥٧. p. ٩١.
٧٤- ديكسون، جي- كان، جي- رين، كولن، الحجارة الاوبيسيدية واصول التجارة" ترجمة رضا جواد الهاشمي، مجلة سومر، مج ٢٨، ١٩٧٢، ص ٢٥٩- ٢٦٠.
٧٥- Charvat. op. cit. p. ١٣.
٧٦- Mellaart. J. Catal Huyuk: The ١٩٦٠ Seasons. In Ancient Anatolia. Ankara. ١٩٩٨. pp: ٣٥- ٤٣.
٧٧- صالح، المصدر السابق، ص ٩٢. وينظر ايضا: الدباغ، الثورة الزراعية" المصدر السابق، ص ١٢٨.
٧٨- الجاسم، المصدر السابق، ص ١٣٦.
٧٩- صالح، المصدر السابق، ص ٩٢.
٨٠- الجاسم، ص ٩٢.
٨١- المصدر نفسة، ص ٩٢.
٨٢- صالح، المصدر نفسة، ص ٩٢.

## * کەرکوك لە هەزارەی سێیەمی پێش زاییندا:-

د. رافیدە عەبدوڵلا قەرەداغی-مامۆستای زانکۆی سلێمانی

بەڵگە نووسراوەکانی هەزارەی سێیەمی پێش زایینی ئاماژە بەوە دەکەن کە ناوچەی کەرکوكو دەورووپشتی وەکو شوێنەکانی تری وڵاتی دوو رووبار بە سیستەمی شارە دەوڵەت (دویلە – مدینە – city -state) بەڕێوە دەچوو. لەپارێزگای کەرکوکی ئەمڕۆ دووسەنتەری ژیاری چالاك هەبوو. یەکێکیان: گاسور Gasur بوو (گردی ترکەڵان لە دووری ٢٠ کم لە باشووری خۆرئاوای کەرکوك لە هەزارەی دووەم ناوی گۆڕرا بۆ نوزی Nuzi.
دووەمیان ئاراپخایە Arrapha (کە پێدەچێت خودی قەڵای کەرکوك بێت لە گەرەکی عەرەفەی ئەمڕۆ)[١].
بەڵگە نووسراوەکان ئاماژە بە چالاکی گاسورو ئاراپخا دەکەن لە کاری بازرگانیو فرۆشتنی کۆیلەو شتو مەکی جۆراوجۆر کە لە وڵاتی لولوبوومەوە دەهات. پەیوەندییە بازرگانییەکان نەبەسترابوون تەنها بە شوێنە نزیکەکانی دەورووپشتی کەرکوکی ئەمڕۆ بەڵکو پەلی دەهاویشت بۆ شوێنە دوورەکان وەکو ئیبلا Ebla (تل مردیخ نزیکی ٤٠ کم لە شاری حەلەبەوە دوورە لە کوردستانی رۆژئاوا).
بەڵگە نووسراوەکانی ئیبلا باسی لە گاسورو ئاراپخا دەکەن لەپاڵ سیمورم Simurrum ولولوپوم Lullubum وگۆتیوم Gutium وکاکموم Ka:mum و خمازی Hamazi وئوربیلم .Urbilumهەروەها لە دەقە ئابوورییەکانی گاسور ناوی خمازی دێت وەکو شوێنێك خەڵکەکەی مامەڵەیان لە گەڵ گاسور کردووە[٢].
بەڵگە نووسراوەکانی سەردەمی ئەکەدی (٢٣٧١ – ٢١٥٦ پ. ز) ناوچەی پارێزگای کەرکوکی ئەمڕۆ ئەخەنە سنووری وڵاتی گۆتیوومەوە، و بەپێی دەقە جوگرافییەکەی سەرجۆنی ئەکەدی (٢٣٧١ – ٢٣٦١ پ. ز) وڵاتی گۆتیوم ئەکەوێتە " لە ئاپول – ئەدەد Apuh - Adad تاخەڵا HalapaL ئەمە وڵاتی گۆتیومە"، هەروەها پێی وایە ئاراپخا ڕاستەخۆ ئەکەوێتە پێش لولوبوم. هەندێ لە توێژەران پێیان وایە ئەم ناوچەیە ئەکەوێتە دەورووپشتی هێڵی پانی (٣٥ – ٣٦) لەزێی خواروو تا رووباری سیروان (دیالە)[٣].
لە چینەکانی سەردەمی ئەکەدی لە گاسور ژمارەیەك دەقی ئابووری دۆزراوەتەوە کە باسی لە کڕینو فرۆشتن دەکات بە دانەوێڵەو شتو مەکی تر بێجگە لە کۆیلە فرۆشتن.
چالاکییە سەربازییەکانی سەرجۆنی ئەکەدی هەموو ناوچەکانی هەرێمی کوردستانی ئەمڕۆی گرتەوەو کەرکوك بەشێك بوو لەو گۆڕەپانەی ئەم چالاکییانە گرتییەوە، بۆیە سەرجۆنی ئەکەدی لەنووسینەکانی ئاماژە بەوە دەکات کە هەموو وڵاتی سوبارتوی گرت لە پاڵ سیمورم Simurrumو ئاراپخا arrapha و لووپوم Lullibim و گۆتیوم Gitium و ئاشوور Assur و چەندەها شوێنی تر[٤].
(نەرام – سینی)ی ئەکەدی پاش دەسەڵاتی گرتە دەست باس لە چالاکییە سەربازییەکانی خۆی دەکات لە وڵاتەبەرزەکان (البلاد العلیا mat -eliu). ناوچەی کەرکوکی ئەمڕۆ وەکو بەشێك لە وڵاتی گۆتیوم ڕاپەری دژی (نەرام – سین) ی ئەکەدی، بۆیە لە دەقەکانی باس لە ڕاپەڕینی (پوتم – ئەتال puttim ATAL) پاشای سیمورم وگوڵان - Gula AN پاشای گۆتیوم لەگەڵ پاشاکانی کاکموم KaKmum ولولوپوم Lullubum وتوروککوم Tukkim ئەکات (ئەم سیانەی دواتر ناویان لە دەقەکە فەوتاوە و شکاوە).
هەروەها نەرام سین باسی لە دەوڵەتە شارێکی تر دەکات لە پارێزگای کەرکوکی ئەمڕۆ کە ناوی ( ئازو خینومە Azuhinnm) " لە ئازوخینوومەوە بۆ کوردا Kurda، ڕۆژە ڕێیەك بەپێ دوورە" توێژەران پێیان وایە ئازوخنینوم ئەمڕۆ گوندی گۆپ تەپەیە لەسەر زێی خواروو لەنێوان کۆیەو تەقتەق[٥].
هەروەها باس لە وڵاتی سوبارتو دەکرێت وەکو زاراوەیەکی جوگرافی کە سنوورەکەی لەباشووری رۆژئاوای ئێرانی ئەمڕۆوە درێژ دەبێتەوە تا دەریای ناوەڕاست، لە باکووری عێلامەوە تا کێوی ئەمانوس لە سوریا " هەموو عیلام بەرەو باراهشتی، وڵاتی سوبارتوو، تا دارستانەکانی سنەوبەر واتا ناوچەی کەرکوك لەم سەردەمەدا بەشێك بووە لە وڵاتی سوبارتوو[٦].
یەکێك لە دەقەکانی کەباسی لە سەروەرییەکانی سەردەمی خۆی دەکات، (نەرام – سین) ئاماژەبەوە دەکات کە پاشاکانی سوبارتوو Subartu وڵاتە بەرزاییەکان دیارییان پێشکەش کردووەو کاتێك بە وڵاتیان تێپەڕیوە: "شازادەکانی شوبیرو سەردارەکانی بەرزاییەکان belu alitim دیارییان پێشکەش کرد، کاتێك بە وڵاتەکەیان تێپەڕی". هەروەها نەرام سین ساڵێك لە ساڵانی حوکمی بەوە دەستنیشان دەکات گوایە: "ئەو ساڵەی نەرام – سین ڕووبەڕووی سوبارتوو بووەوە لە ئازوخینوم". دیارە ئەم پاشایەی باسی لێوە دەکات ناوی تا خش – ئەتالە Tahis - ATAL کە ناوێکی خوریيە[٧].
زۆربەی توێژەران پێیان وایە، پایتەختی گۆتییەکان ئەکەوێتە شوێنێك لە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان لە دەرەوەی وڵاتی سۆمەر ئەکەدو نزیکترین شوێن کە پێی دەچێت گونجاو بێت دیارە شاری ئاراپخایە لە کەرکوك. بەپێی دەقە مێخییە سۆمەرییەکە کە باس لە هاتنی گۆتییەکان دەکات بۆ وڵاتی سۆمەر ئەڵێت " خواوەند (ئەنلیل-Enlil ) لە شاخەکانەوە هێنایین" یان ئەڵێت " خواوەند سەیری شاخی گۆبینی کرد .Gubinبە هەموو زنجیرە شاخەکانی دەرەوەگەڕا" یان لە دەقەکە ئۆتوحیگال کە باس لە ڕووخاندنی گۆتییەکان دەکات" گۆتییەکان، ئەژدیهای شاخەکان، دوژمنی خواوەندەکان، ئەوانەی پاشاگەرایەتی وڵاتی سۆمەریان گواستەوە بۆ سەر شاخەکان". پێی دەچێت ئەراپخا سەنتەری بەڕێوەبردنی فەرمانڕەوایەتی گۆتییەکان بێت لەو کاتەدا بۆیە لە دەقەکە ئاماژە بە گواستنەوەی پاشاگەرایەتی وڵاتی سۆمەر بۆ سەر شاخەکان ئەکات، نەك تەنها ئەمە بەڵکو سەرچاوەکان باس لە کۆمەڵێ دەسکەوتی ژیاری دەکەن لەسەردەمی گۆتی کە بووەتە مایەی نیگەرانی

سۆمەرییەکان، لەوانە کاتێك گۆتییەکان دەسەڵاتیان گەیشتە باشووری مێزۆپوتامیا دەستیان کردە ڕزگارکردنی هەموو کۆیلەکان کە لەڕاستیدا هاونیشتمانی خۆیان بوون، بەهۆی شەڕوپێکدادانەکانی سەردەمی ئەکەدی لە کاتی سەر جۆنی ئەکەدیو نەرام – سین کەوتنە کۆیلایەتی، ئەمەش نەرتێك بوو لەسەردەمە کۆنەکان، زۆربەی دیلەکانی شەڕ دەکران بە کوێلە ئەمە بێجگە لەوەی وڵاتی سوبارتوو سەرچاوەی گرنگی هێنانی کوێلە بوو بۆ وڵاتی سۆمەرو ئەکەد. لە ڕاستیدا ڕزگارکردنی ئەو ژمارە زۆرە لە کۆیلەکان باری نائاسایی دروست کرد لەناو کۆمەڵگای سۆمەریدا، لە ڕووی ئابووریو کۆمەڵاتیش، بۆیە دەقەکە ئەڵێت " وڵاتیان پڕکرد لە ئاژاوە" گوایە خەڵکی تووشی ئاژاوە کرد، چونکە کۆمەڵگای سۆمەری کۆمەڵگایەکی چینایەتی بووە، سیستمی کۆیلایەتی تیایدا باوبووە، ئەمە لەلایەکەوە لە لایەکی ترەوە سیستمی فەرمانڕەوایەتی گۆتی زۆر جیاواز بووە لەگەڵ سیستەمە سۆمەرییەکان، لای سۆمەرییەکان پاشاگەرایەتی دەسەلاتێکی پیرۆز بووەو پشتاوپشت ئەهات، خواوەندەکان دەیانبەخشیە پاشاکان ولە ئاسمانەوە دادەبەزیو زۆربەی پاشاکانی وڵاتی دوو ڕووبار باس لەوە دەکەن: (خواوەند عەشتار خۆشەویستی پاشاگەرایەتی پێ بەخشیم)، بەلام لای گۆتییەکان بەم شێوەیە نەبوو. پاشای گۆتی هەڵدەبژێرا لەنێوان سەرکردەکانی خێڵەکان لە ڕێگەی ئەنجومەنی پیرانەوە، و مەرج نەبووکوڕی پاشا بچێتە شوێنی باوکی، واتا پشتاوپشت نەبوو. ئەمە بووە مایەی نیگەرانی سۆمەرییەکان، هەرچەند پاشا گۆتییەکان هەوڵی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی گەلی سۆمەرییان دەدا، شێوازی حوکمی لامەرکەزییان بەکار دەهێنا، بەلام لەگەڵ ئەوەش خەڵکەکە زۆر بەپەرۆشی بوون بۆ کۆتایهێنان بە حوکمی گۆتی[٨].

گۆتییەکان لە وڵاتی سۆمەر، حوکمی خوجێیەتیان دابووە شارە سۆمەرییەکان، بەبەڵگەی دەوڵەتی (لەگەش) کە لەلایەنی گودیا لەوسەردەمەدا بەڕێوەدەبرا، هەروەها دەولەتی وەرکای کە لەلایەن خودی (ئۆتو-حیگال) فەرمانڕەوایەتی دەکرا کە دواتر سەرکردایەتی ڕاپەڕینەکەی کرد دژی (تریقان Tiriqan)دوا پاشای گۆتی کە تەنها ٤٠ ڕۆژ حوکمی کرد. هەروەها لە شاری (ئومما Umma) دوو شازادەی سۆمەری فەرمانڕەوایەتییان کرد لەژێر سایەی حوکمی گۆتی. ولە شاری ئور پایتەختی وڵاتی سۆمەر پلەی (نادیتوم Naditum– کاهنە علیا) لە پەرستگای خواوەندننا(Nannar) خواوەندی مانگ بەبێ دەستکاری مایەوە بەدرێژایی حوکمی گۆتی وپاشا گۆتییەکان هیچ دەستێوەردانێکیان ئەنجامنەدا بەرامبەری.

سەردەمی گۆتی لە باشووری وڵاتی دوو ڕووبار لە ڕووخاندنی دەولەتی ئەکەدییەوە تا سەردەمی بنەماڵەی ئوری سێیەم ئەکاتە چل ساڵ (٢١٥٦ – ٢١١٦پ. ن) ولە هەندێ شوێن تێکەڵ ئەبێت لەگەڵ سەردەمی ئەکەدی (بەپێی لیستی ناوی پاشا سۆمەرییەکان پاشا پێشینەکانی گۆتی (١ – ٩) لە سەردەمی نەرام سینەوە فەرمانڕەوایەتییان دەکرد، ئەوانی تریش ماوەی (٣٨) ساڵ لە سەردەمی نێوان کۆتاییەکان حوکمی (شار – کالی – شارڕییەوە)وسەرەتای سەردەمی حوکمی (ئۆر – نامو) حوکمیان کردووە، بۆیە زۆر زەحمەتە چینێکی گۆتی دەستنیشان بکرێت لە ڕووی شوێنەوارییەوە وە لە گردو شوێنەوارەکاندا[٩]

بە هەر حاڵ، پاشا گۆتییەکان نووسینێکی زۆریان بۆ بەجێ نەهێشتووین بێجگە لە (ئێریدوڕپزر Erridu –pîzir ) کەسێ دەقی دوورو درێژی بۆ بەجێهشتووین لە پەرستگای (ئیکور E- Kur) پەرستگای سەرەکی خواوەند ئینلیل لە شاری (نوففەر Nippur) کە باس لە سەرکەوتنەکانی خۆی دەکات بەسەر نەیارەکانی لە باکوور.

یەکێك لەو دەقانە باسی لەو لەشکرکێشییە دەکات دژی فەرمانڕەوای مادگا (Madga (کە ناوی لە تێکستەکە شکاوە) پێی دەچێت گوندی مەتیقی ئەمڕۆ لە نزیك داقوق لەوەوە هاتبێت. لەوانەیە ئەم ناوە هەر ناوی ئەوکەسە بێت کە فەرمانڕەوایەتی زۆربەی ناوچەکانی ئاراپخاو میتورانی (سیروانی ئەمڕۆ)ی کرد بێت لە سەردەمی بنەماڵەی ئوری سێیەمدا (٢١١٦ – ٢٠٠٤ پ.).

هەرسێ تێکستەکانی (ئێریدوپزر) پەیوەندییان بە یەکترییەوە هەیە، چونکە کێشەکان پەیوەستن بە ناوچەی کەرکوکی ئەمڕۆو هەولێرەوە. سەرئەنجام تێدەگەین کەوا شۆڕشێك دژی دەسەلاتی گۆتی بەرپا بووە لە شاری (ئۆربیلم)و (مادگا)و (لولوپوم) بەهاندانی (کا–نیشبا KA-Nisba) پاشای سیمورم، بەلام لە کۆتاییدا ڕاپەڕینەکە سەرکوت کراو شکستی هێنا، (نیرشخوخا Nirišhuha) پاشای ئۆربیلم بەدیل گیراو کۆتایی پێهات[١٠].

*** (سەردەمی بنەماڵەی ئوری سێیەم)( ٢١١٢ - ٢٠٠٤پ. ز)**
سەرەرای زۆری بەڵگە نووسراوەکانی ئەم سەردەمە، بەڵام لە رووی مێژووییەوە کەڵکی زۆری نییە، چونکە تەنها پەیوەستن بەکاری ئابووری و چاکسازی، ئەمە بێجگە لە هەندێ کەلیشەی مێژوویی (الصنیع التاریخیة -Date Formulea) کە لە کۆتایی گرێبەستە ئابوورییەکان دێت، کە ناوی ساڵەکانی تێدایە بە شێوەکی کورت و پوخت بەبێ ئەوەی هیچ زانیارییەکی دوورو درێژ بداتە دەستەوە لە سەرکارە سەربازییەکان، چۆن و لە کوێ وچی؟

لەسەرەتادا (ئۆر - نەممو) (٢١١٢ - ٢٠٩٥پ.ن) لە یەکێك لە دەقەکانی باس لەوە دەکات کە " دەبوایە وڵاتی لە پاشماوەی گۆتییەکان پاك بکاتەوە"

(ئۆر - نەممو) بە زۆری بایەخی دەدا بەکاروو باری ئاوەدانکردنەوەو چاکسازی، بەڵام پاش خۆی، جێنشینەکانی پاش ئەوەی وڵاتێکی ئارام و سەقامگیریان بۆ بەجێ مابوو، روویان کردە ناوچەکانی دەرەوەی وڵاتی سۆمەرو ئەکەد بەرەو باکوورو رۆژهەڵات. بۆ نموونە (شولگی Sulgi ٢٠٩٤ - ٢٠٤٨ پ.ن) لە ماوەی ٤٨ ساڵی حوکمی زنجیرەیەك هێرشی کردە سەر ناوچە شاخاوییەکان لە ناوچەی دیالەو حەمرین کەوتەرێی بەرەو باکوور. لە ساڵی (٢٤) هێرشی کردە سەر کارخار Karhar پاشان لە ساڵی ٢٥ - ٢٦ هێرشی کردە سەر سیمورم Simurrim پاشان خارشی Harsi لە ساڵی (٢٧). وپاش چوار ساڵی تر هێرشی دووەمی دەست پێ کرد دژی کارخار ٣١. وپاشان لە ساڵی ٣٢ هێرشی کردە سەر سیمورم وپاش حەوت ساڵی تر هێرشی کردە سەر شاشروم(٤٢).

دوای ئەوە هێرشی کردە سەر ئۆربیلم و سیمورم و لولوپوم و کارخار ولە ساڵی ٤٥ هێرشی کردە سەر کیماش Kimas ولە ساڵی ٤٨ هێرشی کردە سەر خوورتوم Huwurtum یان خومورتوم Humirtim (لەوانەیە خورماتووبێت)[١١].

ئەگەر سەیری ووردی هێڵی شەرەکان بکەین ئەوا ناوچەی کەرکوك ودەوروپشتی پشکی شەریان بەرکەوتووە لەو هێرشانە چونکە بۆ گەیشتنی بۆ ئۆربیلم لە باشوورەوە دەبوایە بە کەرکوکەوە تێپەرێت، وبۆ گەیشتنی بۆ شاشروم (گردی شمشارە لە دەشتی بیتۆین) هەر دەبوایە لە کەرکوکەوە تێپەرێت. ئەگەر بەڵگە شوێنەوارییەکان شوێنی کارخارو خومورتووم پشت راست بکەنەوە لە کەرکوك ئەوا سوودێکی زۆری دەبێت بۆ خزمەتکردنی مێژووی ناوچەکە. بەهەر حاڵ، لە سەردەمی (ئەمار - سین Amar – sin)، (٢٠٤٦ - ٢٠٣٨ پ.ن) ناوچەی دیالەو حەمرین راستەوخۆ کەوتبوونە ژێردەستی بنەماڵەی ئوری سێیەم، بێجگە لە هێرشەکانی بۆ سەر شاشروم (لە رانیە) و ئۆربلیم (هەولێر) لە ساڵی دووەمی حوکمی، ئەمار - سین لە ساڵی حەوتەمی هێرشی کردە سەر شاشروم و فەرمانرەوای سەربازی (حاکم عسكری) بۆ هەر یەکێك لەمانە دانا و بۆ ناوچەکانی (ماراخشی Marahsi)و (سیمانوم Simannm)، (لەزاگرۆس) و ئۆربلیم و کاخارخار و سوربارتوو[١٢].

بەڵگە نووسراوەکان باس لە کەسێك ئەکەن بە ناوی (ئەرادمو Arad – Mu) پەیامنێری شاهانەی شولگی لە وڵاتی سوبارتوو بۆ رێکخستنی کاروباری ئابووری و کارگێری لەنێوان ئەپلاشا Apillasa حاکمی سوبارتوو لە وڵاتی سۆمەر بەڵام دیارە ئەم پەیامنێرە سەرکەوتوو نەبوو بەهۆی لە خۆباییبوونی ئەپیلاشاو بە هێزی دەسەڵاتەکەی:

(کاتێك لەبەر دەرگەکەی کۆشکەکەی وەستام، کەس گوێی نەدایە هاوارەکانم)[١٣].

لەسەردەمی (شۆ - سین)، (٢٠٣٧ - ٢٠٢٩پ.ن) لە ساڵی سێیەمی حوکمی. لەشکرکێشییەك ئەنجام درا بۆ سەر وڵاتی سیمانوم پاشان بەڵگە نووسراوەکان باس لە کۆنترۆڵکردنی وڵاتی سۆبارتوو دەکەن و راگواستنی بە کۆمەڵی دیلەکانی جەنگ بۆ وڵاتی سۆمەر، و لە ئۆردوگا زۆرە ملێیەکان نیشتەجێ کران. ولەپێناوی باشتر کۆنترۆڵکردنی ناوچەکە شۆسین پەیامنێری خۆی دانا بەفەرمانرەوا بۆ سەر هەرێمی سووکوددا (ئیرەننام دانا Er –Nanna بەفەرمانرەوا بۆ سەر هەرێمی سو وکوردا).

لە سەرئەنجامی ئەو شەر وپێکدادانەی کە پاشا بەهێزەکانی ئیمراتۆرییەتی ئوری سێیەم ئەنجامیان دا بۆ سەر ناوچەکانی هەرێمی کوردستانی دەورووپشتی ژمارەیەك زۆر لە ناوی خوری لە بەڵگە نووسراوەکانی وڵاتی سۆمەر دەرکەوت بەتایبەتی لە دەقە ئابوورییەکان، ئەم خورییانە لە بنەرەتدا دیلی جەنگ بوون پاش نیشتەجێکردنیان لە وڵاتی سۆمەر بەماوەیەك راهاتن لەگەڵ ژیانی نوێ هەندێکیان پاش یەك پشت ناوی سۆمەری وئەکەدییان لە منداڵەکانیان دەنا.

ئیمپراتۆرییەتی ئوری سێیەم لەپاش ساڵی سێیەمی حوکمی (شۆ - سین کە لە شکرکێشییەکی ئەنجام دا بۆ سەر وڵاتی سیمورم Simurrum وورده وورده لاوازی تێکەوت وباری ئاسایش و ئابووری تێکچوو وهەرێمەکانی ژێردەستی جیابوونەوە. وچەند هۆکارێك هەیە لە پشت ئەم رووداوانە.

١- گۆرانکارییە ژینگەییەکان هۆکارێکی سەرەکی بوون. وەکو دیاردەی ووشکە ساڵی و سوێر بوونی زەوی لە دەشتە لیتاییەکانی باشووری وڵاتی دوو رووبار کە چیتر رێگەی نەدا گەنم بچێنرێت، ئەمەش کارەساتێکی ژینگەیی بوو، باری ئابووری وڵاتی لاواز کرد، پاشای ناچار کرد لە ناوچەکانی باکوورەوە گەنم هاوردە بکات، بەڵام ئەم هەوڵە سەرکەوتوو نەبوو، بەهۆی هەڵگەرانەوەی (ئیشبی - ئیرا Isbi – Irra) حاکمی ئیسن Isin کە کەوتبووە ژێر رکێفی عیلام وکاری ئەکرد بۆ ئەوەی گەنم نەگاتە پایتەختی سۆمەری (ئور) بە بیانووی ئەوەی چەتە ئامورییەکان رێگەوبانیان گرتووە ورێگە نادەن گەنم بروات بۆ شاری ئور[١٤].

٢- هاتنی گەلانی ئاموری لە رۆژئاواوە بە ژمارەیەکی زۆر کە فشاریان خستە سەر باری ئاسایش و ئابووری وڵاتی سۆمەر بە شێوەیەك چەتەییان دەکردو قافڵەکانیان تاڵان دەکردو بوونە مایەی ترس و تۆقاندن بۆ خەڵکی.

بەم شێوەیە وورده وورده هەرێمەکانی ژێردەسەڵاتی بنەماڵەی ئوری سێیەم دەستیان کردە جیابوونەوە. لەلایەکەوە خورییەکان هەموو ناوچەکانی رۆژهەڵاتی

دیجلەیان گرت لە دیالەوە تا خاپوور واتا ناوچەی کەرکوك وگەرمەسێر هەمووی کەوتە دەستیان.

لەزۆربەی دەقە نووسراوەکانی ئەم سەردەمە ناوی خوری بەدی دەکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئیمپراتۆریەتی ئوری سێیەم لە سەردەستی خورییەکان نەڕووخا، بەڵکو لە سەر دەستی هاوپەیمانی (سوئی - عیلامی - ئاموری) بوو لە ساڵی ٢٠٠٤ پ.ز. بەڵام لە بەڵگە نووسراوەکانی سەردەمی دواتر باس لە گۆتییەکانیش دەکرێت وەکو بە شێك لەو هێزەی کە ئوری ڕووخاند.

لە سەردەمی پاشای سۆمەر (شو - سین) خێڵە ئامورییەکان هاوپەیمانیان بەست لەگەڵ شانشینی سیمورم دژی ئور، وکاتێك لە ناوچەی حەمرین (ئیبخ- Ebih) گردبوونەوە و کەوتنە شەر لەگەڵ سوپای سۆمەری کە بەسەرکردایەتی (شارروم بانی Sarrim – bani) بوو، سیمورم ڕاپەڕی بۆ فریاکەوتنی ئامورییەکان، بەڵام ئەم هاوپەیمانییە زۆری نەخایاند تێکچوو وشکا چونکە ئامورییەکان ڕۆیشتن بەرەو ناوچەکانی باکوور بەرەو ڕۆژهەڵاتی دیجلەوفشاریان خستە سەر سنووری ڕۆژئاوای شانشینی سیمورم لە دەشتی هەولێری ئەمڕۆو کەرکوك، بۆیە (ئیدی – سین Iddi - Sin) پاشای سیمورم کەوتە لێدانیان ودووری خستنەوە بۆ:-

(ماگیا Mgia)، (شاوابی Sawabia)، (ماگی- بابی Magi –babi)، (ئەمتا Amta)، (ئەخاتوم Ahatum)، (یائیلانوم lailanm).

سەرکردەکانی خێڵە ئامورییەکان لە ناوبردن، و دەرمکردن)[١٥].

شانشینی سیمورم پانتاییەکی زۆری گرتبووە و لەم کاتەدا لە ڕووباری دیجلەوە تا سەرچاوەکانی ڕووباری ئەلوەند و لە شاخەکانی پشت بێتواتەوە تا باکووری بەغدا هەمووی لە ژێر دەسەڵاتی شانشینی سیمورم بوو، هەرچەندە پایتەختی ئەم شانشینە تا ئێستا نەدۆزراوەتەوە بەڵام گومانی تێدا نییە کەوا ناوچەی کەرکوك ودەوروپشتی کەوتۆتە سنووری ئەم شانشینە[١٦].

*** ( هەزارەی دووەمی پێش زایین )**

**( سەردەمی ئیسن – لارسا Isin –Larsa ٢٠٠٤ – ١٧٦٤پ. ز)**

پاش ڕووخاندنی ئیمپراتۆرییەتی ئوری سێیەم ٢٠٠٤ پ.ز وڵاتی دوو ڕووبار کەوتە حاڵەتێکی دابەش بوونی سیاسی، تادەرکەوتنی حامورابی لە ساڵی (١٧٩٢ پ.ز)، ئەم سەردەمە لە مێژووی کۆندا دەناسرێتەوە بە سەردەمی (ئیسن – لارسا) یان سەردەمی خێڵە ئامورییەکان.

لە ڕاستیدا، هەردوو دەوڵەتی ئیسن ولارسا لە ململانێیەکی بەردەوامدا بوون لە باشووری وڵاتی دوو ڕووبار، لە ناوچەی دیالە (شانشینی ئەشنونا Esnunna)دەرکەوت، لە باکووری خۆرئاوای دیجلە (موسڵ) دەوڵەتی ئاشووری دەرکەوت، هەردوو دەوڵەتەکە (ئەشنوناو ئاشوور) ڕێککەوتن لەسەر هێرشی کردنە سەر شارە دەوڵەتی (قابرا Qabra) لە (هەولێری ئەمڕۆ) بەپێی ڕێککەوتنەکەی نێوان (شەمشی – ئەددی Samsi –Adad) یەکەمی ئاشووری و (دادوشا Dadusa پاشای ئەشنونا)، هەردوو هێرشیان کردە سەر قابراو کاولیان کرد، بەڵام دادوشا بەدەستکەوتێکی زۆرەوە گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی و زەوییەکەی بۆ (شمش – ئەدەد) بەجێهێشت هەواڵی لەشکرکێشییەکەی دادوشا بۆ سەر (قابرا) لە سەر میلێکی بەردین سپی تۆمارکراوە کە ئێستا لە مۆزەخانەی عێراقییە لە بەغدادە، باس لە قۆناغەکانی ئەم لە شکرکێشییە دەکات، چۆن بە پاڵپشتی خواوەند (تیشباك Tisbak) خواوەندی شانشینی ئەشنونا بەڕێ کەوت بەرەو (قابرا) وبەناوچەی ئاراپخا تێپەڕی ولە هەموو شەڕەکان سەرکەوتوو بوو. لە ڕاستیدا (قابرا)، (ئاراپخا)، (ئۆربلیم) لە قەوارە سیاسییەکانی دەشتەکانی هەرێمی کوردستانی ئەوکاتە بوون کە لەلایەن هاوپەیمانی (ئاشووری – ئەشنونی) لە ناوچوون[١٧].

لەیەکێك لە دەقەکانی شمشارە، کە باس لە پیاوێك دەکات بەناوی (یاشوب – ئەدەد Iasub –Adad) گوایە خەڵکی وڵاتی (ئەخازم Ahazim) دەقەکە بە کەسێکی نالەبار وەسفی دەکات، زۆر خێرا ڕای خۆی دەگۆڕێت وئەملاو ئەولا زۆر دەکات وهەر جارێك سوێندی پیرۆز بۆ پاشایەکی تر دەخوات. گوایە ئەم یاشوب – ئەدەدە لە پەرستگای خواوەند (تیشوب Tesub) لە شاری ئاراپخا سوێندی پیرۆزی بۆ (شەمشی – ئەدەد) خوارد کەچی سوێندەکەی شکاند وچەند جارێك نالەباری نواند[١٨].

زۆری نەخایاند، پاش مردنی (شەمشی – ئەدەد)، (ئیشمی – دەگانی Isme –Dagan) کوڕی هاتە سەر تەخت، وڵاتەکەی بۆ نەچووە ڕێوە وەکو باوکی، بۆیە زۆربەی ناوچەکان بەرە بەرە جیابوونەوە ولە ژێر دەسەڵاتی ئاشووری دەرچوون، سەبارەت بە ئەشنونا حامورابی پاشای بابل لە ساڵی (٣٢) ساڵی حوکمی داگیری کرد وکۆتایی پێهێنا و لە ساڵی (٣٧) حوکمی هاوپەیمانی لەگەڵ وڵاتی سوبارتوو ئەنجامدا (حامورابی).

پاش ئەم ڕووداوانە، هۆزە خورییەکانی ناوچە شاخەوییەکان بەسەرکردایەتی هۆزی (توروککو Turukku) دەستیان کردە ڕامالینی هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی دیجلەو وردە وردە دەستیان بەسەردا گرت ئیتر شانشینی میتانی پاش ماوەیەك دەرکەوت[١٩].

### *(ناوەراستی هەزارەی دووەم-تا هەزارەی یەکەمی پ.ز):

پاش ساڵی (١٥٥٠پ.ز) شانشنێکی گەورە لە کوردستان دەرکەوت بەناوی شانشینی (میتانی Mittani) کە لە سەرچاوە ئاشوورییەکان بەخانی گلبات ناسراوە ولە سەرچاوە میسرییە فیرعەونییەکان بە (نەهارین) ناسراوە، سنوورەکەی لە دەریای ناوەراستەوە تا کێوی زاگرۆس درێژ دەبێتەوە، هەرچەندە زانیاریمان لەسەر ئەم شانشینەکەمە بەهۆی نەدۆزینەوەی ئەرشیفی رەسمی ئەم دەوڵەتە وقوڵنگی کنەوپشکنین نەگەیشتووەتە پاشماوە نووسراوەکانی، بەڵام بەپێی ئەو بەڵگانەی کە لە دەقەکانی (تل العمارنە) بەدەستی توێژەران گەیشتووە (تل العمارنە شاری ئەخت - ئاتوونە پایتەختەکەی ئەخناتوون ئەکەوێتە سەر رووباری نیل لە میسری ناوەراست نزیك ئەسیوت - اسیوط)[٢٠].

هەندێ باس و ئاماژە پێکردن هەیە لە شانشینەکانی دەوروپشتی ولاتی میتانی لە ولاتی حیسییەکان و لە سوریا کە بریتین لەو نامانەی کە ئاڵوگۆر کراون لەنێوان پاشاکانی شانیشینی میتانی و پاشاکانی ولاتی دەرەوە، تێدەگەین کەوا شانشینی میتانی ئەوەندە بەهێز بووە کە توانیویەتی بۆ ماوەی (١٥٠) ساڵ ولاتی ئاشوور بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی و پاشا ئاشوورییەکان نازناوی پاشایان هەڵنەگرتووە بەڵکو تەنها پێیان ووتراوە (حاکم)، وئەم بارودۆخە بەردەوام بوو تا دەرکەوتنی ئاشوور - ئۆبە للیت ١٣٦٥ پ.ز - Asu uballt I.

دەسەلاتی میتانی پێکهاتبوو لە یەکگرتنی سێ هەرێم.

١- هەرێمی رۆژئاوا، پایتەختەکەی ئەلالاخ بوو (تل العطشانة نزیك شاری لازقیە لە رۆژئاوای سوریا).

٢- هەرێمی ناوەراست پایتەختەکەی خانی گلبات (واشوکانی) نزیك سەرێ کانی (تل الفخیریە).

٣- هەرێمی رۆژهەلات پایتەختەکەی نوزی بوو Nuzi (یۆرگان تەپە ٢٠ کم لە باشووری رۆژئاوای کەرکوك تیمێکی ئەمریکی سەر بە زانکۆی هارڤەرد وزانکۆی پەنسەلڤانیا بە هاوبەشی لەگەڵ مۆزەخانەی عێراقی لە بەغداد لە ساڵانی (١٩٢٥-١٩٣١) بەسەرکردایەتی ریچارد.ف.ستار...وهتد کاریان تێدا کردووە)[٢١]. هەرسێ هەرێمەکان سەربە پاشای خوری بوون.

لە شاری نوزی نزیکەی٥٠٠٠ پێنج هەزار تابلۆی مێخی دۆزراوەتەوە، بەلام جێگەی داخە هیچ زانیارییەکی سیاسی تێدا نییە. دەقەکان تەنها ئابوورین، وە ئەوەیان دەرخست کەوا بنەماڵەیەك پێنج پشت حوکمی شاری نوزیان کرد و پاشماوەی کۆشك و تەلاری گەورە لەو شارە دۆزرایەوە کە تایبەتمەندی خۆی هەیە، هەروەها دەقە مێخییەکان تەنها باس لەکشتوکاڵیکردنی گەنم و دانەوێڵە ئەکات لەگەڵ جۆ و کونجی و خشخاش و کەتان و باس لە باخ و رەزو میوەو سەوزەوات، هەروەها لەدەقەکاندا باسی لەدەستْ رەنگینی و پیشەی دروستکردنی گالیسکەو کەرەستەی ناوماڵ وجلوبەرگ و ئامێرەکان و چەکەکان و زۆرێکیان ئەکات، بەلام هیچ زانیارییەکی ئەوتۆی تێدا نییە کەباس لە کاروباری سیاسەت و بەرێوەبردن بکات تەنها نامەیەك نەبێت کە تایبەتە بە (ساوشتتار Saustattar) پاشای میتانی کە لە ماڵی شازادە (شیلوا - تیشوب Selwa – Tesub) دۆزراوەتەوە.

لە بەرۆشنایی دەقەکانی نوزی تێدەگەین کەوا لە بنەماڵەی شیلوا تیشوب کەسانێکی تر هەن کە دەست رۆیشتوو بوون وەکو (تێخیب - تیللا Tehib – Tella) (شورکی - تیللا Surki – Tella)و (زیکی Ziki)[٢٢].

شاری نوزی کە لە سەردەمی ئەکەدی بەگاسور ناسرابوو، پەیوەندی بازرگانی هەبوو لەگەل شوێنەکانی تری کوردستان لە دوورو نزیك، ئەم شارە ئاشتیخوازە پەیوەندی بازرگانی هەبووە لەگەڵ شانیشنی ئیبلا (نزیك حەلەب لە سوریا) و هەروەها لەگەڵ سەنتەرە بازرگانییەکانی ئەنادۆڵ، لە هەزارەی سێیەمی پێش زانییەوە. هەروەها پەیوەندی بازرگانی باشی هەبووە لەگەل شوێنەکانی تری شانیشینی میتانی. بەلام بەهۆی کەمی بەڵگە نووسراوەکان هێشتا زۆر ماوە بوترێت.

بەلام بە گشتی بەهۆی باشی رێکخستن دیارە ئارامی باڵی خشاندبوو بە سەرتاسەری دەوڵەتی میتانی و شاری نوزی پەیوەندی باشی هەبوو لەگەڵ شوێنەکانی باکوورو باکووری رۆژهەلات لەو شوێنانەی کە سەرچاوەی کانزای خاون. هەروەها لەگەڵ سەنتەرە بازرگانییە ئاشوورییەکان لە ئەنادۆڵ (کانیش) چونکە هێڵێکی بازرگانی هەبووە لەنێوانیاندا کە دەرۆیشت لە رۆژئاوای کەرکوکی ئەمرۆ بەرەو ولاتی ئاشوورو ولەوێوە بۆ دەربەندەکانی تۆرۆس بەرەو بانی ئەنادۆڵ بۆ(کانیش Kanis). دەقە مێخییەکانی (کوریووخانی- تل الفخار) لە کەرکوك ئەو راستییەی خستە روو کەوا شاری کوروخانی وێستگەیەکی گەیاندنی چالاك بوو لە پرۆسەی بازرگانی نێوان ولاتی دوو رووبار و بانی ئەنادۆڵ، قافڵەکان لە کوروخانییەوە دەرۆیشتن بەرهەمی کوتاڵ و خوریان دەبرد و کانزایان دەهێنا وەکو زیو و قەسدیر[٢٣].

لەرووی ئیدارییەوە شاری نوزی سەر بە ئاراپخا بوو، تا ئێستا ناوی سێ پاشایان لە دەقەکان هاتووە کە فەرمانرەوابوون لەژێر سایەی پاشای میتانی وساڵانە لە نوزی باج کۆکراونەتەوەو براوە بۆ پایتەختی میتانی (خانی - گلبات) لەلایەن ئەسپ سوارەکان کە لە دەقەکان وەسپ کراون بە (ئەسپ سوارەکانی گالیسکە خانی گلبانییەکان) لە کۆتاییەکانی سەدەی چواردەمی پێش زاینی، بارو دۆخی شانشینی میتانی لاواز بوو، بەرادەیەك شانشینی (حیسی) لە ئەنادۆڵ توانی پەل بهاوێ بەرەو ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی میتانی و هەندێ ناوچەی لێ دابرێت، هەروەها دەرکەوتنی. (ئیریبا - ئەدەدی ئاشووری Eriba – Adad) (١٣٩٢ - ١٣٦٦ پ.ز) باوکی ئاشوور (ئۆبەللیگ Asur – uballit)ی یەکەم (١٣٦٥ - ١٣٣٠پ.ز) بووە مایەی لاوازی میتانییەکان.

لە راستیدا کاتێك (ئاشوور - ئۆبە للیگ) چووە سەرتەخت ولاتی ئاشوور سەربەخۆ بوو ودەرچووبوو ولە ژێر دەسەلاتی میتانی، و دەستی کرد بە پەیوەندی کردنی سەربەخۆ لەگەڵ فیرعەونەکانی میسری و بەزاری (براکەم) قسەی لەگەڵدا

دەکرد. (ئاشوور -ئۆبەللیگ) سەرکەوتوو بوو لەوەی پەل بهاوێت بەرەو دەشتی هەولێر و شاخەکانی دەورووپشتی، هەروەها توانی هێرش بکاتە سەر نوزی و کۆتایی پێ بهێنرێت، و کۆتایی هێنا بە بنەماڵەی (تێخیب تیلا)، زانیاری وا هەیە لە دەقە نووسراوکاندا کە ژمارەی زەرەر و زیانەکان لە نوزی بە ووردی ژمێردراوە و بەڵگە شوێنەوارییەکان دەریخست کەوا (ئاشوور - ئۆبەللیگ) بە دوو قۆناغ شاری نوزی گرت: یەکەم تەنها هێرشی کردە سەری و دەسەڵاتەکەی رووخاند، بە بەڵگەی مانەوەی رۆژژمێری نوزی وەکو خۆی لە دەقە نووسراوەکان (تقویم نوزی). دیارە خەڵکی نوزی هەوڵی دەربازبوونیان داوە بۆ رزگاربوونیان لە دەستی ئاشوورییەکان، بۆیە بۆ جاری دووەم هێرش کرایە سەریان.

دووەم: هێرشێکی سەرتاسەری کرایە سەر نوزی، بەڵام ئەم جارە رایماڵی وکاولی کرد بە تەواوەتی بە شێوەیەک شارەکە پاش ئەم رووداوە جارێکی تر خەڵکی تێدا نەژیاوە وماڵەکان بە سووتاوی بەجێ ماون وتەرمەکان لێرەولەوێ لەناو کۆڵانەکان کەوتوون ونەنێژراون.

دیارە (ئاشوور - ئۆبەللیگ) هەوڵی کۆنترۆڵکردنی وڵاتی بابلیشی دەکرد، کە پێی دەوترا لەوکاتەدا (کاردۆنیاش) و هەوڵی دەستێوەردانی کاروباری ناوخۆی کۆشکی شاهانەی کاردۆنیاشی دەدا، بۆگەیشتن بەم ئامانجە پەنای بردە بەرکاری دیبلۆماسی، ئەویش لە رێگەی هاوسەرگیری دیبلۆماسی، بۆیە کچەکەی خۆی (مۆبەلیگات - شیرو Mubalitat –Seru) مارەکرد لە پاشای کاردۆنیاش[٢٣].

بەڵام ماوەیەک زاواکەی کوژرا، ئەمە لە کاتێکدا کە ململانێی نێوان دەوڵەتی ئاشووری و دەوڵەتی کاشی بەردەوام بوو لەسەر موڵکایەتی زەوییەکانی نێوان کەرکوک تا بەغدادی ئەمڕۆ، لەم کاتەدا پاشای کاشی (کوریکالزوی دووەم) دەرکەوت (١٣٤٥ - ١٣٢٤ پ.ن) و داوای دەکرد بچێتە سەر تەختی شاهانەی ئاشووری بە بیانووی ئەوەی کچەزای پاشا کۆچکردووە، بەڵام جێگرەوەکەی (ئاشوور - ئۆبە للیگ) کە ناوی ئینلیل - نیراری بوو Enlih – Nirari (١٣٢٩ - ١٣٢٠ پ.ن) کەوتە شەر لەگەڵ سوپای کاشی لە ناوچەی نێوان هەردوو دەوڵەتەکە نزیک سوگاگا Sugaga لەخوار هەولێر (ناحیەی ئەلشەگ)ی ئەمڕۆ توێژەران پێیان وایە کوریکالزۆ لەم شەرەدا بەدیل گیراو کوژرا. چونکە (ئینلیل نیراری) یەکەم ئەڵێ " لەبەردەم خواوەند ئاشوور کردمەقوربانی". پاش کۆتایی هاتنی شەر لەنێوان هەردوولا ناوچەی خوار کەرکوک دابەش کرا بۆ دوو بەش "نێوان ساشیلی لە سوبارتو تا کادونیاش کران بە دوو بەشی یەکسان[٢٤].

لە راستیدا شەروپێکدادان لەنێوان سوپای ئاشووری و سوپای کاشی لەسەر موڵکایەتی خاکی باشووری کەرکوک و دەوروپشتی بەردەوام بوو بەرادەیەک هەندێ جار کۆتایی پێ دەهات بە رێکەوتنامەو ئاگربەست. وزۆربەی پاشاکانی سەردەمی ئاشووری ناوەراست (١٥٠٠ - ٩١١پ.ن) ئاماژە بە سەرکوتکردنی کاشییەکان دەکەن لە دەقە شاهانەکانیان، بۆیە ئەبینن (ئەدەد نیراری یەکەم Adad –Niraril)، (١٣٠٧ - ١٢٧٥پ.ن) لە سەرەتای حوکمی دەبوایە رووبەرووی کاشییەکان ببێتەوە لە سەردەمی پاشای کاشی (نازی - مازوتاش Nazi – Marutas)، (١٣٢٤ - ١٢٩٨پ.ن) هەرچەند زانیاری لەسەر بارودۆخی شەرەکە دەگمەن و ئاڵۆزە، بەڵام ئاکامەکانی روون و ئاشکرایە ئەویش ئەوە بوو هەردوولا ئاشووری و کاشی رێککەوتن بە بەستنی رێککەوتنامەی ئاشتی کە سنووری هەردوو دەوڵەتەکە دەستنیشان بکرێن و ناوچەی حەمرین بکرێتە دوو کەرتەوە لەنێوانیاندا[٢٥].

لەم کاتدا لە مێژوو، نەیارەکانی دەوڵەتی ئاشووری یەکیان گرت هاوپەیمانییەکیان بەست، ناسراوە بە هاوپەیمانی (حیسی - میتانی- ئەخلامو) حیسییەکان لەسەردەمی پاشاکەیان (خاتو شبیلشی سێیەم) ومیتانییەکان لە سەردەمی پاشاکەیان (شاتوارای دووەم) و هۆزە ئارامییەکان (ئەخلامو) کە لەم کاتەدا دەرکەوتن لە رۆژئاوای وڵاتی ئاشوورو فشاریان خستە سەر ئاسایش و ئابووری ئاشوور، بەڵام پاشای ئاشووری توانی ئەم هاوپەیمانییە بشکێنێت و بە سەختی گورزی کوشندە بهاوێتە گۆتییەکان ولولوپییەکان: "ژیانم لە جەستەی سەربازەکانیان دەرکرد، وەك چۆن ئاو ئەچێتە ناو خاك"

پاشای ئاشووری بەوە نەوەستا بەڵکو هەموو وڵاتی زاموای راماڵی و گەیشتە وڵاتی (خالمان Halman) (ناوچەی دیالە) و سوباری (کەرکوك) بەشێك بوو لە وڵاتی سوباری، پاشا ئاشوورییەکان درکیان بە گرنگی ناوچەکانی رۆژهەڵاتی دیجلە دەکرد وەکو سەرچاوەیەك بۆ کەرەستەی خاو وەکو تەختەو ئاسن و برۆنز و دانەوێڵە مس و قەسدیرو مەروماڵات ئەمە بێجگە لە هێزی کاری مرۆیی کە لە ئاکامی بەدیل گرتنی دوژاوەکانی جەنگ دەبران بۆ وڵاتی ئاشوور وەکو پیشەوەرو کرێکار ئیشیان دەکرد بەڵام بەبێ ئەوەی بکرێن بە کۆیلە.

هەروەها کۆنترۆڵکردنی ناوچە شاخاوییەکانی رۆژهەڵاتی دیجلە دڵنیابوون لە سەلامەتی هێڵە بازرگانییەکانی نێوان وڵاتی ئاشوورو بەرزاییەکانی زاگرۆس و تۆرۆس، بۆیە ئاشوورییەکان لەپێناوی پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان بەردەوام بوون لە هێرش کردنە سەر وڵاتی گۆتیوم و لولوپیوم و دەوروپشتیان وراپەرینەکانیان سەرکوت دەکردن[٢٦].

کاتێك (توکولتی نینۆرتای یەکەم Tukulti –Ninurtal)، (١٢٤٤ - ١٢٠٨) هاتە سەر تەخت پێشنەیەکی باشی هەبوو لە سەر ناوچەکانی رۆژهەڵاتی دیجلە چونکە سوودی لە ئەزموونەکانی پاشاکانی پێش خۆی وەرگرتبوو، بۆیە لێزانانە مامەڵەی لەگەڵ بارودۆخەکە دەکرد.

لەسەرەتای حوکمدا، گۆتییەکان شانشینیەکیان دامەزراند بە ناوی (ئوقومانی Uqummani) یان (قومانی Qumani) لە ناوچەکانی باکووری زێی خواروو، و هاوپەیمانیان بەست لەگەڵ سەرکردەکانی ئاپولی Abuli لە رۆژهەڵاتی دیجلە لە ناوچەی کەرکوکی ئەمڕۆ). شانشینی ئوقومانی لە رووەکانی کۆمەڵایەتییەوە زۆر پێشکەوتوو بوو، شاری شورداری هەبوو، هێزە سەربازییەکانی زۆر بەباشی رێکخستبوو، بەڵام ئاشوورییەکان پێشکەوتووتر بوون لە رووی تەکنیکی و توانای سەربازییەوە بۆیە نەدەبوو سوپای ئوقومانی ئاوەها

به ئاسانی بچنه پێشەوەو ڕوو بە ڕوویان ببنەوە، بەڵکو دەبوایە بە تاکتیکی شەڕی (پارتیزانیان) یان بکردایە، لێرەدا سوپای ئوقومانی شەڕەکەی دۆڕاند، توکولتی نینورتا ئەڵێت:

" وڵاتی قوتوم بە تەواوەتی کاول کرد، کردم بەرووخاوەی پاش لافاو. سوپاکەم گەمارۆدا بەرەشەبای لم، لەوکاتەدا، لە ناوچەی سەختو شاخاوی کۆکرابووەوە، دوژمنەکانم خۆیان قایم کرد بوو لە شوێنێکی سەخت. بەڵام بەپشتیوانی خواوەندە مەزنەکان لێم دان، لێدانێکی کوشندە، ڕاوم نان، ئەشکەوتەکان و دەربەندەکانم پڕکرد لە تەرمی کوژراوەکانیان، تەرمەکانم لەسەر یەك کۆکردەوە وەکو خەرمانی گەنم نزیك دەروازەکانیان، شارەکانیانم ڕاماڵی و کاولم کردن، پاشان بوومە فەرمانڕەوای وڵاتی گۆتیومی فراوان".

پاش ئەم ڕووداوە سەرکردەکان و شازادەکانی ئوقومانی بران بۆ وڵاتی ئاشوور بەدەستگیرکراویی و سوێندی لایەنگیریان خوارد بۆ پاشای ئاشووری و دەبوایە باجی ساڵانەیان پێشکەش بە دەسەڵاتی ئاشووری بکردایە. پاشان لە دەقە ئابوورییەکانی ئاشوور ناوی کەسانێك دەرکەوت کە خەڵکی وڵاتی ئوقومانی بوون ئابوونەیان وەرگرتووە[27].

پاشای کاشی کاشتلیاشی چوارەم (١٢٤٢ - ١٢٣٥پ.ز) دەرفەتی ئەوەی قۆستەوە کە پاشای ئاشووری تۆکولتنی - منیورتای یەکەم لەشەردا بوو لە ناوچەکانی باکوور دژی ئۆرارتییەکان، بۆیە دەستی کردە پەلهاویشتن بەرەو پارێزگای کەرکوکی ئەمڕۆ لەو شوێنانەی ئەکەوێتە نێوان زێی خواروو بەرەو ڕووباری دیالەو عوزێم.

بەمردنی تۆکولتن نینۆرتای یەکەم لە ئاکامی کودەتایەك کە کورەکەی خۆی ئەنجامی دا (ئاشوور - ناسر پاڵ ا). وڵاتی ئاشوور کەوتە لاوازیو سنووری بچووك بووەوە، و دەسەڵاتی لاواز بوو بەرادەیەك پاشای ئاشووری ئازناوی پاشای هەڵنەدەگرت، بەڵکو پێی دەوترا (حاکم) ئاشوور. لەم کاتەدا کاشییەکان دەستیان گرت بەسەر ناوچەکانی گەرمیان بەرەو وڵاتی زابان (لە ناوچەی کێوی حەمرین تا سەرچاوەکانی ڕووباری سیروان) (ئەگار -سالو - Agar Salu) کە لەوانەی ناوچەی سالەیی بێت کە هەندێ کەسی وا دەزانێ لە ساڵحییەوە هاتووەو هەندێ کەس پێی دەڵێت. دەشتی بەیات[28].

لەسەردەمی پاشای ئاشووری (ئاشوور - دانی یەکەم Assur –Danl (١١٧٩ -١١٣٤پ. ز) عیلامییەکان لە ناوچەی دیالەوە گەیشتنە بابلو دەوڵەتی کاشییەکانیان ڕووخاند لە ساڵی ١١٦٢پ. ز لە سەردەمی پاشای عیلامی (شوترۆك - ناخونت Satruk –Nahunte). پاش (٣٠) سی ساڵ عیلامییەکان دەستیان لە ناوچەی گەرمیان بەرداو بۆیان نەبرا بەرێوە ئاشوورییەکان ئەم دەرفەتەیان قۆستەوە و پەلیانهاویشت بەرەو ناوچەکانی دەوروپشتی زێی خواروو تا کێوی حەمرین (پارێزگای کەرکوکی ئەمڕۆ ئەگرێتەوە).

بەردەرکەوتنی توکولتی ئاپڵ - ئیشار (تجلات بلاسەری سێیەم (١١١٥ - ١٠٧٧پ. ز) ئاشوور باڵادەست بوو لە ناوچەی کەرکوك و دەوروپشتی (لە باشووری زێی خواروو تا باکووری بەغداد)، لە سەردەمی ئەم پاشایە شەڕ لەگەڵ ئۆرارتییەکان بەسەختی بەردەوام بوو، هەروەها هۆزەکانی دەریا لە ناوچەی ئەنادۆڵەوە هێرشیان دەکردە سەر باکووری وڵاتی ئاشوور، هەرێمەکانی تاباڵو کموخی Tabal and Kumuhi لە هەمان کاتدا شەڕ لەگەڵ بابل بەرپا بوو، بەڵام توکولتی ئپیل - ئیشار سەرکەوتوو بوو تیایدا: "لە کاردونیاشەوە هاتم، ئەودیوی زێی خواروم ڕاماڵی، شاری ئارمان Arman کە ئۆگار - سالو Ugar'–Saluu فەرمانڕەوایی دەکرد هەتا شاری لوبدو Lubda (لوبدو ئەکەوێتە ناوچەی حەمرین - باشووری جەلەولا - گولالە. ئەو شارانەی ئەکەونە نزیك شاخی کامولا (لەوانەیە کمالان بێت) و کاستیل (لەوانەیە تەشیلە بێت نزیك مەنسورییە جەبەل حەمرین) سەروەتو سامانیانم هێنا بۆ ئاشوور، شارەکەم[29].

لە دەقێکی تردا ئەڵی"پێشکەوتم بەرەو کاردونیاش، شاری تورشانم داگیر کرد Tursan لەودیوی زێی (لەوانەیە گردی تورشە بێت) شاری ئارمان شارەکەی ئۆگار - سالو تا شاری لوبدو ڕووباری ڕەدانو Rudanu (عوزێم) شارەکانی نزیك کاشتیلەو شاخی کامولام داگیر کرد".

کارەکانی توکولتی - ئاپل - ئیشا - وڵاتێکی ئارامی بۆ جێنشینەکەی بەجێهێشت، بۆیە (ئاشوور بیل کالا Assur bel – kala –)، (١٠٧٤- ١٠٥٧پ. ز) باس لە ڕاوکردنی ئاسكو پشیلە کێویو ورچو گورگ دەکات لەگەڵ ئاسکی (نیالو Niallu) و (ئاسکی ئیل Ailu) و گای کێوی لە کێوەکانی ئیبخ (حمرین) زازامیرو Azamiru (ئەزمەڕ) لە وڵاتی لولومو و لە هەندێ تێکست باس لە بردنەوەی گەلە ئاسك ئەکاتەوە بۆ ئاشوور وەکو ڕانە مەڕ[30].

* **( هەزارەی یەکەمی پێش زایینی-٩١١ - ٦١٢پ. ز):-**

پاش دەرکەوتنی هۆزە ئارامییەکان کە لە ڕۆژئاوای وڵاتی ئاشوورەوەو تەشەنەکردنی هێزی ئارامی لە وڵاتی بابل بەرادەیەك هۆزەکانی سوتو Sutu هەموو باشوورو ناوەڕاستی وڵاتی دوو ڕووباریان ڕاماڵی و تاڵانیان کرد، لەم کاتەدا لە وڵاتی ئاشوور قاتو قڕی دەستی پێکردبوو، بەرادەیەك هیچ باسێك نابیسرێت دەربارەی وڵاتی ئاشوور لە نووسینەکاندا تا دەرکەوتنی ئاشوور-دانی دووەم Assur Dan۲ – کە توانی سنوورێك دابنێ، بۆیە تەشەنەسەندنی هێزی ئارامی لە ڕۆژهەڵاتی دیجلەو ڕاوی نان تا (ڕوقاخو Ruqahu) لەسەر زێ و باس لە (خالخالاوش Halhalaus) دەکات (لەوانەیە ناوی خالخالان لەوەوە هاتبێت).

پاش (ئاشوور دانی دووەم) ئەددنیراری دووەم ٩١١ - ٨٩١پ. ز) هاتە سەرتەخت کە ڕووبەڕووی (ئیلویا Iluia) بووەوە پاشای قومانم، "بەفەرمانی خواوەند ئاشوور، سەرداری گەورە، سەردارەکەم، گالیسکەکەم لێخوڕیو سوپاکەم برد بەرەو وڵاتی قومانو، وڵاتی قومانووی فراوانم داگیر کرد، ئیلویا پاشای قومانوم دەستگیرکرد، براکانیم پۆل پۆل سەربڕی، ڕاوم نان، و تێکمشکاندن، سەروەتو سامانیانم بە تاڵان برد، مەروڵاتیان، کردمن بەدیاری بۆ خواوەند ئاشوور گەورەکەم، پاشماوی سوپاکەی هەڵهات لە ترسی چەکەکەم،

پاشان گەڕانەوە بۆلامو خۆیان دا بەدەستەوە، منیش لە شوێنی ئارام نیشتەجێم کردن[٣١].

دیارە ئەمانە پاش کۆنترۆلکردنی شاری ئاراپخا و دەوروپشتی ڕوویداوە، چالاکییەکانی گەرمیان و کوێستانی گرتەوە:

"لەودیوی زێی خواروو، ولاتی لولوممو، ولاتی (خانجو Hahhu زاموا) هەتا دەربەندەکانی ولاتی (نامرو Namru) ولاتی قومانی فراوان تا ولاتی (میخرو Mihru) و سالوا و نورارتو لە دەقێکی تردا:

" لە شاخەکانی (یالمانەوە Ialman) تا ڕووباری (توران Turan) و لە شاری لاخیرو Lahiru تا ئۆگار سالو هەمووم خستە سەر ولاتی (دیر Der) شاری ئاراپخام هێناوە دەست و (لوبدو Lubdn) قەلاکانی ولاتی کاردونیا تا سنووری ولاتی ئاشوور"

– یالمان لە ناوچەی حەمرین (حەلوانە)
– توران ڕووباری سیروانە.
– ئۆگار – سالو (ناوچەی سالەیی).
– دێر .. تلول العقر نزیك بدرە و جەسان نزیك مەندەلی.

بەدەرکەوتنی ئاشوور – ناسر – ئاپلی دووەم (Assur-Nasir)، (٨٨٣– ٨٥٨پ.ن) (ئاشوور ناسر پالی دووەم) ناوچەی کەرکوك و دەوروپشتی باسیان لێوە ناکرێت، چونکە پێشتر خراوەتە سەر ولاتی ئاشوور.

هەروەها جێنشینەکەش بەهەمان شێوە (شلمان – ئوسەر – شلمنصری سێیەم) (٨٥٨ – ٨٢٤پ. ن)، بەلام لە سالی هەشتەمی حوکمی شەلمانو ئوسەر شۆڕشێك لە ولاتی بابل بەرپاکرا (کاردونیاش) بەسەرکردایەتی (مردۆخ – زاکر – شومی Marduk –Zakir- Sumi) کە داوای یارمەتی کرد لە پاشای ئاشووری تابتوانێت شۆڕشەکە سەرکوت بکات. شەلمانو ئۆسەر ئەم هەلەی بەباش زانیو سوپاکەی برد بەرەو ناوچەی دیالە بۆ لێدانی سەرکردەی یاخیبووەکان (مردۆخ – بیل – ئۆساتە Marduk – bel – usate) کە برای مردۆخ – زاکر – شوومی بوو.

"کەوتمە ڕێ بۆ تۆلە سەندنەوەی شارەکانی (میتورنات Me – turnat) و (لاخیروم Lahirum) داگیرکرد". دیارە شەلمانسەر ناوچەی کەرکوك تێپەڕی بەرەو ولاتی (زابان Zaban) کە توێژەران پێیان وایە ناوچەی مەنسورییە لە کێوی حەمرین تا میتۆرنات کە دەشتی دیالەیە[٣٢].

مردۆخ – بیل – ئۆساتە پاش گەیشتنی سوپای ئاشووری شکستی هێناو رایکرد بەرەو ناوچەی کێوی (ئیبخ Ibih) حەمرین بەرەو خالمان (حەلوان) بەلام لە دەستی شلمنسەری سێیەم ڕزگاری نەبوو:"لەنۆیەم فەرمانڕەوایەتیم لەکاتی لەشکرکێشی دووەم بۆ سەر (ولاتی بابل) شاری (گەنانات Gananate) داگیر کرد، مردۆخ – بیل – ئۆساتە بۆ ڕزگارکردنی ژیانی خۆی ڕای کرد بۆ خالمان دوای کەوتم، بە شمشێر کەوتمە مردۆخ – بیل – ئۆساتە خۆی وئەو سەربازانەی لەگەلی بوون. پاشان ڕۆیشتم بەرەو بابل[٣٣].

پاش مردنی شەلمانۆئۆسەری سێیەم ولاتی ئاشوور بەرەو لاوازی چوو، شازادەکان کەوتنە ململانێ لەگەل یەکتریدا، تەنها شوێن کە بەدەستی سوپای ئاشوورییەوە مابوو شاری (کالخۆ Kalhu) بوو، تا سەردەمی (شمش ئەدەدی پێنجەم Samsi – Adad) کە چوار سالی یەکەمی حوکمی بەوە بردە سەر هەول بدات بارودۆخی ولاتی ئاشوور ئارام بکاتەوە.

لە نووسینەکانی خۆیدا باس لە خیانەتکاری براکەی خۆی ئەکات، (ئاشوور – دان – ئەپلا: Assur – dan –abla).

" کاتێك ئاشوور – دان – ئەپلا خیانەتی کرد. لەسەردەمی باوکی شەلمانو – ئۆسەر، و خەلکی هاندا بۆ شۆڕش، و خۆی ئامادەکرد بۆ شەڕ، لەو کاتەدا هەموو ولاتی ئاشووری خستە پال خۆی لە سەرەوە تا خوارەوە، بە سوێند خواردن ملکەچی کردن بۆ شەڕ" پاشان باس لە ڕاپەڕینی ٢٧ بیست و حەوت شار کە بەشدارییان کرد لەو ڕاپەڕینەدا لەنێوانیاندا شاری ئاراپخا بوو، و شەمشی – ئەدەد هەموویانی سەرکوت کرد و ڕاپەڕینەکەی ڕامالی. دەقەکە ئاماژە بە ناوچەکانی باشووری ئاراپخا دەکات (لوبدو نزیك داقوقە).

وزابان (لە حەمرینە لەو شوێنەی ڕووباری سیروان کێوی حەمرین ئەبڕێت) لە پاش زنجیرەیەك کاری سەربازی لە ڕۆژهەلاتی دیجلە، پاشای بابلیو ئاشووری جارێکی تر کەوتنە شەڕوپێکدان، بەهۆی ئەوەی کە بابل هەولی دەدا دەستێوەردانی کاروباری ناوخۆی ولاتی ئاشوور بکات، بۆیە شەمشی – ئەدەدی پێنجەم هێرشی کردە سەر ناوچەکانی باکووری ولاتی بابل:–

"لە لەشکرکێشی چوارەمم. لە پانزەی مانگی سیڤان ڕووباری زێی خوارووما پەڕیمەوە، و کەوتمە ڕێ بەرەو ولاتی کاردونیاش لە دەربەندەکانی نێوان شارەکانی زادی Zadi وزابان Zaban سێ دانە شێرم ڕاوکرد، لە کێوی ئیبیخ Ibih (حەمرین) تێپەڕیم وشاری میتۆرانم Meturan گەمارۆدا"[٣٤].

پاش زنجیرەیەك شەڕوپێکدادان لەگەل سوپای بابلدا لە ناوچەی دیالە وورده وورده ولاتی بابل بەرەو لاوازی دەڕۆیشت، لە هەمان کاتدا مادەکان دەرکەوتن وەکو هێزێکی بەرچاو لە گۆڕەپانی سیاسیو سەربازی کۆنترۆلی هێلە بازرگانییەکانی نێوان هیندو و جزیرەی عەرەبیان دەکرد و نەیاندەهێشت کالا بگاتە ولاتی دوو ڕووبار.

شەڕ لەنێوان بابلو ئاشوور بەردەوام بوو لەسەر ناوچەکانی باشووری کەرکوك وکێوی حەمرین، لەڕاستیدا شەش خول شەڕی کاولکاری و خوێناوی ڕوویدا کە تێچوونێکی زۆری ویست لە ڕووی ماددی ومرۆیی بۆیە توێژەران پێیان وایە ئەو ڕووداوانە کاریان کرد بۆ لاواز کردنی ئاشوورو بە هێزکردنی کلدانییەکان لە بابل.

بە مردنی شەمشی ئەددی پێنجەم، و بەهۆی منالی کورەکەی (ئەدەد نیراری سێیەم ٨١٠ – ٧٨٣ پ. ن) سەمیرامیس دایکی وەکو (وەسی) بەسەرییەوە بوو تا پێگەیشتو چووە سەر تەخت، لەم کاتەدا ناوچەی کەرکوك و دەوروپشتی لەژێر دەسەلاتی ئاشووریدا بوو، بۆیە ناوی نەدەهات لە نووسینەکانی ئەم سەردەمە، بەلام پاش ماوەیەکی تر وورده وورده ناوچەکانی لوبدو (لە باشووری کەرکوك)وئۆتۆ (لە دەشتی تەق تەق) ئاسایشیان تێکچوو.

پاش مردنی ئەدەد نیراری سێیەم هەر چوار کورەکەی یەك بەدوای یەك هاتنە سەر تەخت، ماوەی چل ساڵ وڵاتی ئاشوور کەوتە لاوازی، لە مردنی ئەدەد نیراری سێیەمەوە تا هاتنی توکولتی - ئاپل - ئیشاری سێیەم (تجلات بلاسەری سێیەم ٧٤٤- ٧٢٧ پ. ز) کە لە زەمانی ئەودا چەند پێکدادانێك لە دەورووپشتی زێی خواروو روویدا، بۆیە پاشای ئاشووری، پەنای بردە بەر سیاسەتی ڕاگواستنی بە کۆمەڵ.

"خەڵکانی ئەو شارانەی ڕامگواستن... لە ناوچەی تورتان سەرکردەی باڵا بۆ ناوچەی (راب - بیلوب) سەرۆکی خزمەتکارەکان. ناوچەی بەرخازیا، ناوچەی بازاموا... نیشتەجێم کردن و هێشتم پەیمان بە یەکتری بدەن و بە خەڵکی وڵاتی ئاشوورم دانان[٣٥].

پاش ماوەیەکی تر، لە یەکێك لە دەقەکانی، (توکولتی - ئاپڵ - ئیشار/ ٣) باس لەوە دەکات کە ناوچەکانی باکووری وڵاتی بابلی خستەسەر سنووری ویلایەتی ئاراپخاو خستییە ژێر فەرمانڕەوایەتی حاکمی ئاراپخای ئاشووری.

" هەڵمکوتایە سەر پوکودو Pukudu وەکو تۆڕ - ژمارەیەکی زۆرم لێ سەر برین، ودەسکەوتی زۆرم لە هۆزی پوکودو برد، شاری لاخیرو کە هی (ئیدیبرینا Idibirina) بوو. شارەکانی خیلیمو Hilimu بیلوتو Bilutu کە ئەکەونە سەر سنووری عیلام، هەمووم خستە سەر وڵاتی ئاشوور، خستمە ژێر دەسەڵاتی شوێنکەوتووەکەم حاکمی ئاراپخا. و خەڵکەکەی لوبدوم ڕاگواست و لە وڵاتی ئاشوور نیشتەجێم کردن[٣٦].

لەسەردەمی توکولتی ئاپل - ئیشار باس لە قەوارەیەکی میدی دەکرێت بەناوی (بیت - هامباندا Bit – Hambanda) کە پێی دەچێت ناوی هەمەوەند لەوەو هاتبێت.

* (سەرجۆنی دووەمی ئاشووری (٧٢١ - ٧٠٥ پ. ز):-

هۆزەکانی کلدی لە بابل یەکیان گرت لەگەڵ عیلام لە باشووری وڵاتی دوو ڕووبار کە سنووریان بەیەکەوە بوو وبەرژەوەندی هاوبەش لەنێوانیاندا هەبوو، کاتێك مەردۆخ بەلادان Marduk – iddin چووە پاڵ عیلامییەکان لە ٧٢١ پ. ز سەرجۆنی دووەم لە ڕۆژهەڵاتی دیجلەوە بە ناوچەی کەرکوکی ئەمڕۆ تێپەڕی و ناوچەی کێوی حەمرینی بڕی و گەیشتە ناوچەی بەغدادی ئەمڕۆ. بەڵام لە شکرکێشییەکەی شکستی هێناو بۆ ماوەی دە ساڵ وەستاو مەردوخ بەلادان بە پشتیوانی عیلام وەکو خۆی مایەوە[٣٧].

* (سین - ئاخی - ئیریبا سەنحاریب ٧٠٤ - ٦٨١ پ. ز)

خاکی نێوان وڵاتی بابل و ئاشوور لە حاڵەتێکی ناجێگیر بوو بەهۆی شەڕو ململانێی نێوان هەردوو دەوڵەتەکە. سەنحاریب لە نووسینەکانیدا باسی لە شەڕێك ئەکات دژی کشییەکان لە وڵاتی (یاسوبیکالا lasubikala) و (کیلامژا Kilamzha) و (هارتیشبی tlartisbi) و (بیت قوبادی Bit – Qubadi) لەگەڵ چەندەها شاری تری بێ شومار، پاشان خەڵکی بیت قوبادی ڕاگواستەوە بۆ هارتیشبی و هەر سێ ویلایەتەکەی خستە سەر یەك یەکەی کارگێڕی کە شاری ئاراپخا چەقەکەی بوو لەژێر کۆنترۆڵی فەرمانڕەوایەکی ئاشووری[٣٨].

پاشان خەڵکە کاشییەکەی ژێردەستی و خەڵکی یاسوبیکالاتە وانەی کەوتنە دەستی لە شاخەکانەوە ڕایگواستن و لە شارەکانی هارتیشبی و بیت قوبادی نیشتەجێی کردن، وپاشان هەموویانی خستە سەر ناوچەی ئاراپخا، لێرەدا ئاراپخا بووە یەکەیەکی ئیداری گەورە لە ناوچەکانی ناوەڕاست و باشووری زاگرۆسەوە تا ناوەڕاستی عێراقی ئەمڕۆ تا ڕووباری دیجلە درێژ ئەبووە وە.

* (ئاشوور - ئاخی - ئیدن (ئەسەرحەدوون) ٦٨٠ - ٦٦٩ پ. ز)

لەسەردەمی ئاشوور - ئاخی - ئیدن (ئەسەرحەدوون) ناوچەی کەرکوك ودەورووپشتی تا ڕادەیەك ئارامی بە خۆوەوە بینی کێشەکان بە زۆری لەگەڵ عیلام و ئورارتوو سکیشیەکان وکیمیرییەکان و مادەکان بوون، (ئاشوور - ئاخی - ئیدن) گەیشتە ئەو خاڵەی کە دەبێ سوود لە هەلومەرجە مێژووییەکان وەربگرێت، بۆیە مادەکانی کردە هاوپەیمانی خۆی، بۆ ئەوەی وەکو قەڵغانێك دژی عیلامییەکان و ئورارتییەکان و سکیشییەکان وکیمیرییەکان بەکاریان بهێنێت، ئەم سیاسەتە سەرکەوتوو بوو تا کۆتایی سەردەمی ئاشوور پانیپال.

* (ئاشوورپانی - ئەپلی (ئاشوور پانیپال ٦٦٨ - ٦٢٧ پ. ز):-

لە سەردەمی ئاشوورپانی ئاپلی مادەکان زۆر بەهێز بوون ودەستیان کردە بنیادنانی ئیمپراتۆرییەتەکەیان بە سەرکردایەتی کەی - خەسرەو کوڕی فراوەرتیس، وڵاتی زاموا و ئاراپخا بوونە بەشێك لە ململانێ نێوان بابل و ئاشوور. لە بابل شەمەش - شوم - ئوکن برا دوانەکەی ئاشوورپانی - ئاپلی ڕاپەڕینی بەرپا کرد دژی براکەی، ناوچەکانی ناوەڕاست و باشووری وڵاتی دوو ڕووبار بوونە دوو بەشەوە بەشێکیان لەگەڵ ئاشوور و بەشێکیان لەگەڵ بابل بەڵگە نووسراوەکان زۆر بەڕوونی باسی لێوە دەکەن.

لە باشووردا، (سین تابنی ئوسەر Sin – Tabni – usur) حاکمی شاری ئور نامەیەکی نارد بۆ (ئاپلیا Aplia) حاکمی ئاراپخا و بۆ (نابو - ئوشابشی Nabu – Usabsi) حاکمی ئوروك و پێیان ڕاگەیەنێت کەوا پەیامنێرێك لە شمش - شوم - ئوکنەوە گەیشتە ئەوێ و ئامادەکاری دەکات بۆ شۆڕش دژی، و هۆزی جوراسیموی ئارامی شۆڕشیان بەرپاکرد دژی، بۆیە پێویستە فریای بکەون پێش ئەوەی کار لە دەست بترازێت. لێرەدا حاکمی ئوروك نزیکەی ٥٠٠ - ٦٠٠ تیر هاوێژی ئامادەکرد لە خەڵکی ئوروك لەگەڵ حاکمی ئاراپخا (ئاپلیا) پێکەوە لەگەڵ نوریا Nuria حاکمی زاموا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بارودۆخەکە حاکمی ئوروك کوڕەکەی خۆی (نابو - زیر - ئیدنینا Nabu – zer – iddinna )ی نارد بۆ شەڕی جوراسیمو ئەمیش پێنج شەش پیاوی جوراسیموی تەسلیم بە ئەپلیا کرد، بەڵام پاش ماوەیەکی تر بەهۆی گۆڕینی بارودۆخەکە کوڕەکەی ئاپلیا حاکمی ئاراپخا کەوتە دیلی لای جوراسیموکان لە ناوچەی باب - سامی لە باشوو[٣٩].

بەهەر حاڵ، (ئاشوور پانی - ئاپلی) لە ماوەی سێ ساڵ توانی کۆتایی بە شۆڕشەکەی (شەمەشی - شوم - ئوکن)

بهێنێت. بەڵام هێزی میدی تا دەهات بەهێز تر دەبوو، دە ساڵی کۆتایی حوکمی (ئاشوور پانی ئاپلی) نادیارە بەهۆی کەمی بەڵگە نووسراوەکان، بەڵام دیارە مادەکان ڕۆژهەڵاتی دیجلەیان نەبینیبوو کاتێك ئاشوورپانی ئاپلی کۆچی دوایی کرد ساڵی (٦٢٧ پ. ن) کورەکەی چووە شوێنی کە ناوی (ئاشوور - ئەلیلو - ئیلی Assur – etillu –elli) کە پێش مردنی باوکی بە دوو ساڵ دەستبەکار بوو (٦٣٠ پ. ن) و زۆر نەژیا برا دووانەکەی چووە سەر تەخت (سین - شار - ئوشکن) (٦٢٣ پ. ن) (Sin – sar –uskin) تا ڕووخاندنی نەینەوا ٦١٢پ.ز.

لەم کاتەدا لە بابل، سەرکردەی خێڵێکی ئارامی کلدی کە ناوی نابو بلاسسەر بوو (Nabu apli –usur) سەربەخۆیی بابلی ڕاگەیاند (پێشتر جێنشینی مردۆخ بلادان بوو).

نابوبلاسسەر هەڵکشایەوە بەرەو باکوور ووردە ووردە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئاشووری داگیر کرد. لە ساڵی ٦١٥پ.ز گەیشتە پایتەختی کۆنی ئاشوورییەکان (ئاشوور) واتا ناوچەی کەرکوکی ئەمرۆی داگیر کرد، بەڵام کشایەوە بۆ تکریت بەهۆی دەرکەوتنی هێزی میدی لە ڕۆژهەڵاتەوە و چەق بەستنیان لە ئاراپخا.

لە ساڵی (٦١٤)پ. ز مادەکان شاری ئاشوور و شاری تربیسۆ (گردی شەریف خان)یان داگیرکرد و گەمارۆی نەینەوایان دا، لەم کاتەدا هەردوولا میدی و کلدانی هاوپەیمانییان بەست، بەپێی ڕێکەوتنامەکە ئەمیتس کچەکەی (کەی - خسرەو) درا بەنابوخەزنوسسەر (Nabu- Kudurri –Usur) کە جێنشینی باوکی بوو و تا ئێستا سەرچاوە مێخییەکان باسی لەم هاوسەرگیرییەیان نەکردووە و تەنها سەرچاوە بۆ ئەمە هیرۆدۆتسە.

ئاشوورییەکان هەوڵیان دا ڕزگاریان بێت لەو هەموو دوژمنەی دەوری دابوون، و هەوڵیان دا سوود لە هاوپەیمانەکانیان وەربگرن وەکو هۆزە ئارامییەکانی سەر فورات و میسر و سکیسییەکان، بەڵام (کەی خسرو) خێزانی بوو، توانی سکیسییەکان ڕازی بکات بەوەی هاوپەیمانی بن دژی ئاشوورییەکان کلدانی پێکەوە هێرشیان کردە سەر نەینەواو ڕووخاندیان ساڵی (٦١٢پ.ن)[٤٠].

* سەرچاوە و پەراوێزەکان:-
١- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ٥٢.
٢- هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٥٢.
٣- Hallo RLA band٣ p.٧١٩
٤- Gmyson. A.K "the empire of sargon of Akkad" AFO(١١) (١٩٧٤ ١٩٧٧) p.٥٩-
٥- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ٣٨، ٥٢.
٦- هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٣٨.
٧- هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٥٩.
٨- هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٥٤-٥٥.
٩- هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٥٦.
١٠- Frayne e.D. RIME ٢.E٢.٢. ١٤ p.٢١٨-٢٣٠
١١- هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٦١.
١٢- هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٦١.
١٣- هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٦١.
هەروەها بروانە:- Kozad. M.A. the northern Transtigr is in the first half of the second Milliennium B.C. Leiden (٢٠٠٣)
١٤- Gelb Hurrians and Subarians p.٣٩
هەروەها بروانە:- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ٦١.
١٥- گۆڤاری هەزار مێرد ژمارە١ لاپەرە ١١٥-١٢٣، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (صخرة غريب هەڵەدنی) نووسینی د. رافدة عبدالله، د. كوزاد محمد.
١٦- Kozad. p.٩٠-٩١
١٧- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ٦٥-٦٦.
١٨- Eidem and Lassoe. J. shimara Texts. Vol. I.p.٧٢-٧٦
١٩- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ٦٧-٧٥.
٢٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٧٦.
هەروەها بروانە:
- مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة بەرگی دووەم، تەها باقر، لاپەرە ٦٨
- كتبوا على الطين ادوارد كيرا، وەرگێڕانی مەحموود ئەمین، بەغدا ١٩٦٤، لاپەرە ١٩٤-١٩٥.
٢١- كتبوا على الطين ادوارد كيرا، وەرگێڕانی مەحموود ئەمین، بەغدا ١٩٦٤، لاپەرە ١٩٤-١٩٥.
٢٢- آثار بلاد الرافدين، ستيون لويد، وەرگێڕانی: سامی سەعید الاحمدی، دار المأمون للطباعة، بغداد، ١٩٨٥، لاپەرە ٢٠٦.
٢٣- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ٧٧.
هەروەها بروانە:-
Faruq al-Rawi. studies in the commercial life - of an administrative area of eastern assyria" thesis admitted to the unversity if wales for the degree of PH.D ١٩٧٧.p.٧٠-٧٢.
- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ٧٨-٧٩.
- مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة بەرگی یەکەم، تەها باقر، لاپەرە ٤٤٨-٤٦٢
٢٤- التطورات السياسية في بلاد الرافدين في العصر الآشوري الوسيط، زياد عويد سويدان المحمدي، نامەی ماستەی سالی ٢٠٠٣، لاپەرە ٥١.
- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ٧٨-٧٩.
٢٥- هـ.س. پ، لاپەرە ٧٩.
٢٦- التطورات السياسية في بلاد الرافدين في العصر الآشوري الوسيط، زياد عويد سويدان المحمدي، نامەی ماستەی سالی ٢٠٠٣، لاپەرە ٥١.
٢٧- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ٨٣-٨٦.
٢٨- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ٧٨-٩٢.
٢٩- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ٩٥-٩٨.
٣٠- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ٩٥-٩٨.

٣١- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ١٠١.
هەروەها بڕوانە:-
Grayson. A. ARI. P.١٣٤.
٣٢- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ١٠١-١٠٢.
٣٣- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ١٢٣-١٣٠.
* هەندێ لە توێژەران بێت زادي دەخەنە نزيك خورماتوو هەندێكيشيان دەيخەينە نزيك ئاڵتوون كۆپرى يان دوبز، بۆ زياتر بڕوانە وائيل حەنوون كە دەڵێت:- پێی وايە گردی ماحوزە كە نزيكی ١٢كيلۆمەترلە دووبزەوە دوورە، هەروەها ببينە لە سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە ٣٣دا لە لاپەرە ١٤٧.
٣٤- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ١٣٦-١٤٠.
هەروەها بڕوانە:-
Hanoon. Studies in the historial geography of northern iraq. P.٣٩٢
٣٥- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ١٤٧.
هەروەها بڕوانە:-
Luckenbell. Arab. P.٢٧٠.
٣٦- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ١٤٩-١٥٠.
هەروەها بڕوانە:-
Luckenbell. Arab. P.٢٨٠.
٣٧- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ١٥١.
هەروەها بڕوانە:-
- مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة بەرگی يەكەم، تەها باقر، لاپەرە ٥١٤-٥١٨
٣٨- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ١٥٩.
هەروەها بڕوانە:-
Luckenbell. Arab. P.١١٨.
٣٩- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ١٦٥.
٤٠- كوردستان العراق في التأريخ القديم في ضوء النصوص المسمارية من الألف الثالث قبل الميلاد حتى سقوط نينوى ٦١٢ قبل الميلاك، د. رافدة عبدالله عبدالصمد الصفحة ١٦٦-١٦٨.

*** مێژووی کۆنی کەرکوك**
**لەبەر رۆشنایی دەقەکانی نوزی (١٩٩٩ - ١٣٣٠ پێش زایین):**
**توێژینەوەیەکی مێژوویی، سیاسی، ئابوورییە.**

**نووسینی: د. کامەران کوێخا جەلال**

*** دەروازە: تیشکێك بۆ مێژووی دۆزینەوەی تابلۆکانی نوزی:**

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەمدا هەندێك تابلۆی لێرەو لەوێ، لەلایەن چەند توێژەرێکی ئەورووپییەوە بلاوکرایەوە. (پنچس Pinches)، یەکەم کەس بوو لە ساڵی (١٨٩٦)ی زایینیدا گرێبەستێکی بلاوکردەوە، کە بەزمانێکی ئەکەدی ناباو نوسرابۆوە، ناوەکەسێتییەکانی بەڵگەنامەکە تایبەتمەندێتییەکی ئاسایی نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا نەبووە جێ سەرنجی زانایان.

لە ساڵی (١٩٠٢)ی زایینیدا بەڵگەیەکی تری هاوشێوەی ئەوەی پێشوو لەلایەن (مایسنەرەوە Meissner) بلاوکرایەوە[١]، ئەم زانایە لە رێگای بازرگانێکی شوێنەوارەوە بۆی دەرکەوتوو بوو، کە ئەو بەڵگەنامانە بۆ شاری (وێرانشار Vyran - Šehir)ی دەورووبەری کەرکوك دەگەرێنەوە[٢]، ئەو بازرگانە ٣٠٠ تابلۆی تری لەگەڵ ئەو تابلۆیەدا رەوانەی ئەورووپاکردبوو[٣].

سەرەرای بلاوکراوەکانی تر، (گاد Gadd)، یەکەم کەس بوو، کە چیرۆکی راستەقینەی دۆزینەوەی تابلۆکانی (نوزی) خستە بەردەست توێژەران و گرنگی مێژوویی بەڵگەنامەکانی دەرخست[٤].

لە ماوەی بوونی لە عێراقدا، (ئیدوارد کیرا Edward Cheira)، لەگەڵ خاتوو (گیرتروود بێل Gertrud Bell) بەرێوەبەری ئەوکاتی بەرێوەبەرایەتی شوێنەواری عێراق دەربارەی هەندێك تابلۆ، کە کەوتووبوونە بازارەکانی عێراقەوە قسەی کردبوو، کە ناوەرۆکی ئەو تابلۆیانە زانایانی سەرسام کردبوو[٥]. دوای ماوەیەك بەهۆی پزیشکێکی خەڵکی ناوچەکە، توانرا شوێنی راستەقینەی تابلۆکان بدۆزرێتەوە. (بێل) داوای لە کیرا کردبوو لە کەرکوکدا پشکنین ئەنجام بدرێت[٦]، بەلام لەسەر داوای ولیام کۆرنەر (William Corner) پشکنینەکان لە ١٣کم لە باشووری خۆرئاوای کەرکوکدا، لە (یۆرغان تەپە - (نوزی) کۆن).

پشکنینەکان بە دوو قۆناغ ئەنجام دران:

یەکەمیان بەسەرپەرشتی کیراو لەسەر ئەرکی مۆزەخانەی عێراقی، قوتابخانەی ئەمریکی بۆ لێکۆڵینەوە خۆرهەلاتییەکان (ASOR) لە بەغدا، لە ساڵی (١٩٢٥)ی زایینیدا دەستی پێکرد. لەو قۆناغەدا لە کاتی پشکنینەکاندا بە رێککەوت لە نزیك شوێنی کارکردنەکەدا بەهۆی دارمانی ژوورێکەوە ئەرشیفێك، کە نزیکەی (١٠٠٠) تابلۆی تێدا بوو دۆزرایەوە، ئەو ئەرشیفە بۆ خێزانی (تێخیپ - تیللا) دەگەرایەوە[٧].

لە قۆناغی دووەمدا، کە دوای وەستانێکی کاتی، لە ماوەی هاوینی ساڵی (١٩٢٦)ی زایینیدا، لە ساڵی (١٩٢٧)ی زایینیدا پشکنینەکان دووبارە دەستیان پێکردەوەو تا ساڵی (١٩٣١)ی زایینی درێژەیان کێشا، ئەمجارە بە سەرپەرشتی رۆبەرت فایفەرو رۆبیرت ستار (Robert Pfeifer، R. Starr) و لەسەر ئەرکی مۆزەخانەی هارڤەردی سامی و پەیمانگای خۆرهەلاتی زانکۆی شیکاگۆ بوو، جگە لە کۆشکی کارگێری شارەکە، چەند کۆشکێکی ترو چەند ئەرشیفێکی تایبەتی و پەرستگای شارەکە (شەوشکا - عەشتار) دۆزرانەوە، کە زیاتر لە (٣٠٠٠) تابلۆی لە خۆوە گرتبوو، سەرەرای برێکی زۆر لە پارچەی شکاو، لەگەڵ ئەو تابلۆیانەی تردا، کە بە شێوەی نارەسمی دۆزرانەوە، گەیشتە نزیکەی (٥٠٠٠) تابلۆ[٨].

جگە لە ئەرشیفی تۆمارەکان، برێکی زۆر لە پاشماوەی (ماد)ی دۆزراوەتەوە، کە لە چینی دووەمی پاشماوەکاندا بوون، وەك: پاشماوەی تەلارە تایبەتی و حکومییەکان و پەرستگایەك، لە نزیکەی دووری (٣٠٠) مەتر لە باکووری دیواری شارەکەوە دوو گرووپ تەلار دۆزرانەوە کە سەر بە هەمان پاشماوە بوون[٩]، ئەمە سەرباری کەلوپەل جۆراوجۆری سوالەت و.. تاد.

زۆربەی ئەم دۆزراوانە لە چینی دووەمدا، بۆ ناوەراستی هەزارەی دووەمی پێش زاین دەگەرێتەوە، بەپێی دۆزینەوەی شوێن مۆری (شەوشتەتار)ی پاشای میتانی، کە لە چارەکی کۆتایی سەدەی پانزەی پێش زایینیدا فەرمانرەوایەتی کردووە، دەقەکانیش بۆ ئەو سەردەمانە دەگەرێنەوە[١٠]. لە گرێبەستێکی (تێخیپ - تیللا)دا هاتووە، "ئەو ساڵەی ئیتخیا بوو بە پاشا..."، یان "ئەو ساڵەی (کوشی - خارپا) بوو بە فەرمانرەوای (خەززانو) شاری (نوزی)"[١١]، ئەمانەش دیاریکردنی مێژووە بە شێوەی ناوخۆیی، بەلام لەو سەردەمە، یان کەمێك دواتر بوون. زانایان پێیان وایە، ئەو سەردەمەی دەقەکانیان تێدا نوسراوەتەوە نزیکەی (٨٥ - ١٥٠) ساڵ بووە[١٢]، کە بۆ نێوان ساڵانی (١٤٥٠ - ١٣٤٠) پێش زاین دەگەرێنەوە[١٣]. بەلام هیچ کام لەم لێکدانەوانە بە کۆتایی نازانرێت، ئەوەش بۆ سروشتی دەقەکان دەگەرێتەوە، بۆیە پێویستی[١٤] بە توێژینەوەی زیاتر هەیە.

*** تەوەری یەکەم:**
**کەرکوك لە کۆنەوە تا کۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زایین:**

*** باسی یەکەم:**
**هەندێ تایبەتمەندێتی جوگرافی پێگەو تۆپۆگرافیا:**

بە پێی بەرزاییەکانی دەورووبەری، لە باکوورەوە زنجیرە بەرزاییەکانی (کانی دۆمەڵان)[15] بەسەر شاری کەرکوك‌و ناوچەکەدا دەڕوانێت[16]، بەوەش دەکەوێتە دەشتە فراوانەکانی خۆرئاوای زنجیرە چیاکانی زاگرۆس[17]، کە لە باشووری خۆرئاواوە بە زنجیرە بەرزاییەکانی حەمرین (ئیبیخ – Ebeĥ) کۆتایی دێت‌و وەك سنوورێکی سروشتیی[18] ناوچەکەیە[19]. (نوزی) دەکەوێتە باشووری ناوچەی بانی کەرکوك‌و بە ناوچەی گواستنەوەی نێوان دەشتی لیتە لە باشووری خۆرئاواو ناوچەی زورگ‌و شاخاوی لە باکوورو باکووری خۆرهەڵات ناسراوە[20]، تا بەرەو باشووری خۆرئاوا بڕۆین، رادەی بەرزی‌و نزمی کەم دەبێتەوە، کە لەسەر ئاستی دەریاوە لەنێوان (٢٠٠ – ١٠٠٠) م دایە، بەوەش کرداری داروتان‌و نیشتن کەمتر دەبێتەوەو بارستایی خاك زیاد دەکات‌و دەشتەکانی فراوانتر دەبێتەوە، ئەوەش بووەتە هۆی ئەوەی ئەم ناوچەیە بۆ کشتوکاڵ‌و ئاودێری دەست بدات، وەك چاندنی گەنم‌و جۆو بەتایبەت چاندنی کونجی کە (نوزی) زۆر پێی بە ناوبانگ بووە[21] لەگەڵ ئاژەڵداری[22].

شانشینی (ئەراپخا) لەگەڵ چەند وڵاتێکدا هاوسنوور بووە، کە چەند شارستانەتییەکی جیاوازیان لە خۆ گرتبوو، گومان لەوەدا نییە کە لە هەردوولاوە کارتێکردن هەبووە، بە تایبەت لە رووی کەلتورییەوە. زانیاری تەواو نییە کە لە باکووری خۆرهەڵاتەوە چ دەوڵەتێ هەبووە، بەڵام بەپێی رووداوە مێژووییەکان، لە دەقەکانی نوزی (گاسووری کۆن)دا لە هەزارەی سێیەمی پێش زاین، باس لە ناردنی دانەوێڵە بۆ خەڵکی شیموروم[23] کراوە، بەوپێیە دەبێ دراوسێی (نوزی) بووبێت[24]. شاری ئاشوور لە خۆرئاواوە بە دووری (٨٠) کم بووە[25]، کە لە لێواری زێی بچووکدا ئاوایی (تورشا – Turša) لەنێوانیاندا بووە، لە باشوورەوە وڵاتی (کاشی – کششو) بووە[26]، کە ناوی چەند ئاواییەك زانراوە، وەك: (دور – ئوبلا Dur - ūbla)و (ئەپیل – سین Apil - sîn)، هەرچەندە شوێنی ئەم ئاواییانە بەتەواوەتی نەزانراوە[27].

لە کۆنەوە ئەم ناوچەیە جێی شارستانییەت بووە، چونکە پاشماوەی زۆر لەو ئاوایی‌و گوندو شارانە تا دەوڵەتش هەر ماوەتەوە، کە بۆ چاخەکانی پێش مێژوو دەگەڕێنەوە، وەك، (بەردە بەڵکە) لە چاخی بەردینی کۆن (١٢٠٠٠٠ – ١٢٠٠٠) پێش زایین، (چەرموو) لە چاخی بەردینی نوێ (٩٠٠٠ – ٦٠٠٠) پێش زایین، (کەریم شایەر)، (پاڵە گەورە)، لەلای خۆرهەڵاتەوە، (مەتارە) لە لای باشوورەوە لە چاخی کانزاکاری (٥ – ٣) هەزار ساڵ پێش زایین[28].

لە دەقەکانی نوزیدا ناوی هەندێ کەناڵی ئاوی‌و رێگا تۆمارکراوە، ئەوەش بایەخی تایبەتی هەیە، بۆ دیاریکردنی پێگەو کێشانی نەخشەی شانشینی (ئەراپخا) بەگشتی‌و بە تایبەتی (نوزی)و دەورووبەری هەیە[29]. یەکێك لەو رێگایانەی کە (نوزی) بە شارەکانی ترەوە دەبەستێتەوە، ئەو رێگایەیە کە بە ئاراستەی خۆرئاوا دەچێت‌و بە چەند ئاواییەکدا تێپەڕ دەبێت، تادەگاتە لێواری زێی بچووك[30] لە پاشماوەی شاری (ئەپیناش – Apenaš)، لەوێشەوە دوو رێگای لێدەبێتەوە، یەکەمیان بەرەو باکوور تا دەگاتە شاری زیزا (Zizza)، کە دەکەوێتە سەر کەناڵێکی ئاوی، رێگای دووەم لە ئەپیناشەوە بەرەو خۆرئاواو دوای ئەوەی کە بە شاری (ئوناپش –و Unapše (we))دا[31] تێپەڕدەبێت، لە لێواری باشووری زێی بچوکدا دەگاتە (تورشا)، کە بە (تەل ماخوز) ناسراوە، رێگاکە بە درێژایی ئەم زێیەدا بەرەو باشووری خۆرئاوا دەچێت تا دەگاتە شاری (ناتمانی – Natmani) کە بە (تەل عەلی) ناسراوە[32]، دووری نێوان ئەم دوو شارە (١٢کم)ەو دووری نێوان (تورشا) لەگەڵ نوزیدا (٤٢) کم‌و لەگەڵ کەرکوکدا نزیکەی (٥٢ کم)ە[33]. رێگای دووەم لە نوزییەوە بەئاراستەی باکووری خۆرئاوا دەڕوات‌و بە (زیزا)دا تێپەڕدەبێت تا دەگاتە (خوراسینا – رابو – Ĥurasena - rabu)، لە لێواری باشووری زێدا، ئەم رێگایە دووبارە دەگاتەوە شاری (تورشا)[34].

لەلایەکی ترەوە کەناڵە ئاوییە سروشتی‌و دەستکردەکان هۆیەکی ترن بۆ بەدەستهێنانی زانیاری جوگرافیایی ناوچەکە. وەك زانراوە شارەکانی ئوناپشوو زیزا کەناڵی ئاوییان هەبووە، کە دەچێتەوە سەر ئاوێك کە لە دەقەکانی نوزیدا بە شواخ (Šuaĥ) ناسراوەو هەردوو ناوچەکەی بەیەکەوە گرێداوە، ئەم ئاوە لە شێوەی دۆڵێکدایە[35]. لە باشووری نوزیدا گۆماوێکی تر هەبووە (Artiĥ) کە بە جارو ناسراوە، بەستێکی تر هەیە کە بە تازەخورماتودا تێپەڕ دەبێت، کە هەردوو ئاواییەکانی (تارکولیو – Tarkuli/we) و ئولامم (Ulamme) لە لێواریدایە[36]، هەر لە باشوورەوە شارێکی تری گرنگ کە زۆر پەیوەندی بە نوزییەوە، هەبووە لوبدییە (Lubdi, Lubdu, Lubti)، کە دەشێت (تاووقی – داقوق)ی دەوڵەت بێت[37].

*** ئاوو هەوا:**

بەپێی هێڵە پانەکانی باکووری گۆی زەوی، ئەم ناوچەیە دەکەوێتە نێوان بازنەی پانی ٣٤ پلە لە لای باشوورو ٣٥ی باکوور، بەو پێیەش دەکەوێتە ناوچەی گەرمەسێر، کە زستانی ساردو باراناوییە، پلەی گەرمی لەنێوان ٤,٥ – ١٣,٥پلەی سەدییە، لە هاویندا گەرم‌و ووشك‌و ناوەندی پلەی گەرمی ساڵانەی لەنێوان ٢١,٧ – ٤٢,٨پلەی سەدییە، لەکاتێکدا رادەی باران بارینی ساڵانەی دەگاتە ٣٧٤ملم، بەوەش دەکەوێتە ناوچەی بارانی نامسۆگەرو ساڵی وا هەیە کە بەرووبوومە دێمییەکان دەکەونە بەر مەترسی ووشکە ساڵی[38]. هەر بۆیە بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو کەم بارانییە لەم ناوچەیەدا بایەخ بەئاودێری رووبارو کەناڵە ئاوییەکان دراوە[39]. بنیاتنانی شارەکانی (ئەراپخا)و (نوزی) لە سەر، یان نزیك لقەکانی (رەدانو – العظیم)داو هەڵکەندنی کەناڵی ئاوی، کە زۆربەی کێڵگە کشتوکاڵییەکانی بنەماڵەکانی

(نوزی) لەوناوچانەدا بووە[٤٠]، ئەم ڕاستییە دووپات دەکەنەوە.

هەر چەندە چەند ئاوایی‌و شارێکی زۆر لە ناوچەی کەرکوکدا هەبوون، بەڵام هیچیان وەك (نوزی)و (ئەڕاپخا) و کوڕووخانی نەبوون چ لە ڕووی نزیکی، یان پەیوەست بوونیان‌و لەیەك چوون لەهەموو ڕوویەکی شارستانی‌و مێژوویی. بۆیە لێرەدا بە پێویست دەزانرێت کە لێیان بکۆلرێتەوە:

* **(نوزی)**:

بەپێی توێژینەوە جیاجیاکان ڕوون بووەتەوە کە ناوی هەر شارێك بەپێی سەردەمە مێژووییەکان گۆڕانی بەسەرداهاتووە، چونکە لەهەر قۆناغێکی مێژووییدا گەلێك یان زمانێك زاڵ بووەو بەپێی ئەو زمانە ناوەکەش گۆڕاوە.

سەبارەت بە ناوی (نوزی)، لە کۆنەوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەڵام بەهۆی نەبوونی پاشماوەی تۆمارکراو، نەزانراوە کە لە چاخەکانی پێش (سۆمەر)ی چ ناوێکی تری هەبووە، ئەوەی تادەوڵەت زانراوە کۆنترین ئاماژە بۆ ئەم شارە بۆ (ئێبلا)[٤١] دەگەڕێتەوە، واتە پێش چاخی ئەکەدی (٢٣٣٤ – ٢١٩٨)ی پێش زایین، کە بە شێوەی ئێبلایی (Ga - su - lu$^{ki}$)، و ڕێنووسە ئەکەدییەکەی Ga - surx$^{ki}$ تۆمارکراوە[٤٢]. زانایان ئاماژەیەکی ڕوونیان بۆ واتاو بنەڕەتی وشەکە نەکردووە[٤٣]، لە سەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زایینەوە ناوی (گاسوور)[٤٤] کەمتر ناو براوە، چونکە لە سەردەمی گوتی نزیکەی (٢٢٠٠ – ٢١٢٠)ی پێش زایین بەدواوە ناوی (ئەڕاپخا) زیاتر لە تۆمارەکاندا دەردەکەوێت. بە تایبەتی لە سەردەمی (بنەماڵەی سێیەمی ئور)ەوە (٢١١٢ – ٢٠٠٤)ی پێش زایین[٤٥].

لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەی پێش زایینیەوە (خورییەکان)، کە پێشتر لە ناوچەکەدا بڵاوبووبوونەوە ناوی شارەکەیان بۆ (نوزی) [٤٦] گۆڕی، بەو پێیەی لە دەقەکانی نوزیدا ناوی (نوزی) ($^{URU}$Nu - zi) هاتووە[٤٧]، زۆر پێدەچێت بنەڕەتی ناوەکە خوری بێت. سەبارەت بە هۆی گۆڕینی ناوەکە بۆ (نوزی)، بەڕای (جەمال ڕەشید)[٤٨]، لە ناوی کەسایەتییەك لە دانیشتووانی شارەکە نزیك بووە، واتە لەناوی کەسایەتییەکەوە هاتووە[٤٩]. سەرچاوەی تریش هەن کەوا گۆڕینی ناوەکە بۆ نۆژەنکردنەوەی پەرستگای (عەشتار) دەگێڕنەوە، کە بۆ چاخی گاسوور دەگەڕایەوە، تا ببێت بە پەرستگایەك بەناوی خواوەند شاوشکا، هەروەها نۆژەنکردنەوەو ئاوەدانکردنەوەی شارەکە[٥٠]. بەلێکدانەوەی هەردوو بۆچوونەکە دەگەینە ئەوەی، کە لە ناوی کەسایەتییەکی پایەبەرزەوە هاتووە، چونکە نۆژەنکردنەوەو ئاوەدانکردنەوەی پەرستگا، یان هەر شارێك لەلایەن کەسانی خاوەن دەسەڵات‌و پایەدار ئەنجامدراوە، بۆیە ڕەنگە گۆڕینی ناوی شارەکە پەیوەندی بە کەسایەتییەکی خوری‌و نۆژەنکردن‌و ئاوەدانکدنەوەی شارەکەوە هەبێت.

پاشماوەکانی شاری (نوزی) لەژێر گردێکی (٢٠٠ × ٢٠٠) مەتردایە، کە نزیکەی ٣٣٠م لەسەر ئاستی دەریا و ١٥م لەسەر دەورووبەرەکەیدا بەرزە، بنیات نراوە[٥١]، لە هەزارەی سێیەمی پێش زایینی وەك پێشتر ئاماژەی پێکراوە بە گاسوور ناسرابوو و دەوڵەت بە (یۆرغان تەپە – Yorghan Tepe)ناسراوە، دەکەوێتە باشووری خۆرئاوای کەرکوکی دەوڵەت بە دووری ١٣کم، و ٣کم لە گوندی ترکەڵان دوورە[٥٢].

پاشماوەکانی شاری (نوزی) دەکەوێتە لێواری خۆرئاوای خاسە، کە یەکێکە لەوسێ لقەی ئاوی (ڕەدانو[٥٣] – العظیم) پێك دەهێنن‌و دواتر لە شاری (بەلەد) دەڕژێتە ناو ڕووباری دیجلەوە، زێی بچووك بە باکوورو باکووری خۆرئاوایدا تێپەڕ دەبێت، کە لە دوورترین شوێندا نزیکەی (٤٢کم)ە[٥٤].

* **ئەراپخا** (Arrapĥa):

بە پێی بەڵگە شوێنەوارناسی‌و مێژووییەکان، پاشماوەکانی کۆنە شاری (ئەڕاپخا)[٥٥]، لەباکووری خۆرهەڵاتی شارەکەدا، دەکەوێتە ژێر کەلاوەکانی قەڵای کەرکوکی دەوڵەت، لە ژێر گردێکی نیمچە بازنەیی، کە نزیکەی (١٢٠) پێ لەسەر ئاستی دەورو بەریدا بەرزبووەتەوەو لە لێواری خۆرهەڵاتی ڕووباری خاسەدا بنیاتنراوە. بەشی خوارەوەی قەڵاکە بۆ چاخەکانی پێش مێژوو دەگەڕێتەوە، سەرەوەشی بۆ چاخە ئیسلامییەکان دەگەڕێتەوە. لە سەردەمی عوسمانیدا چوار دەرگای سەرەکی هەبووە، هەر دەرگایەکیان بە ناوی ناوچەکەیەوە یان دیاردەیەکەوە ناو نراوە، دەرگای سەرەکی، دەرگای (باب ئەلتۆپ)، دەرگای حەوت کچ وحەلواچییەکان. جگە لە تەلاری ماڵەکان، مزگەوت‌و تەکیەی تێدا هەبووە، هەروەها لە چاخە کۆنەکاندا پەرستگای پێغەمبەر دانیال لەم شارەدا بووە[٥٦].

تا ئێستا کنەو پشکنینی ڕێکوپێك لە پاشماوەکانی (ئەڕاپخا)دا ئەنجام نەدراوە، بۆیە ناتوانین بە دڵنیاییەوە مێژووی ئاوەدان بوون یان بنیاتنانی ئەم شارە دیاری بکەین‌و سەردەمەکانی جیابکەینەوە. بەڵام بە ووردبوونەوە لە پاشماوەکانی دەورووبەریدا، وەك: (چەرموو) (٧٠٠٠ – ٦٥٠٠)ی پێش زایین، (مەتارە هەزارەی شەشەمی پێش زایین‌و.. تاد، بۆ ئەو سەردەمە یان دواتر بگەڕێتەوە. سەبارەت بە چاخە مێژووییەکان، (جەمال ڕەشید)[٥٧] پێی وایە کە گوتییەکان شاری (ئەڕاپخا)یان بنیات ناوەو دواتر خوری تێدا نیشتەجێ بوون، بەوپێیەی کە چەندین تابلۆی قوڕین دۆزراوەتەوە، کە بە خەتی مێخی‌و زمانی (ئەکەدی – خوری) نوسراون‌و بۆ بنەماڵەیەکی خوری بەناوی (Wullu) دەگەڕێتەوە، ئەم بنەماڵەیە لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زایین) خاوەندارێکی گەورەی شانشینی (ئەڕاپخا) بوون[٥٨].

مێژووی ناوبردنی (ئەڕاپخا) بۆ هەزارەی سێیەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە[٥٩]، لە هەزارەی دووەمی زانییدا ناوی (ئەڕاپخا) لە تۆمارەکانی (تحوتمسی یەکەم)ی فیرعەونی میسردا (١٥٢٨ – ١٥١٠)ی پێش زایین، کاتێك، کە دەسەڵاتی گەیشتە سوریا، بە (A - ri - p - na - ĥa)، هەروەها ناوی چەند شارێکی تری دەورووبەری تۆمارکراوە[٦٠].

*** کورووخانێ (تەل ئەلفەخار):**

(کورووخانێ)[٦١] پاشماوەی شارێکی کۆنە، کە دەوڵەت بە (تەل ئەلفەخار) ناسراوە، بە دووری نزیکەی ٤٥کم دەکەوێتە باشووری خۆرئاوای شاری کەرکوك‌و (نوزی) بە نزیکەی ٣٥کم، لەسەر ڕێگای کۆمپانیای نەوت، کە بە دۆڵی نەوت ناسراوە. پاشماوەکانی ئەم شارە بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٩٦٧)ی زاینییدا دۆزرایەوە، ئەم شوێنە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوارناسیی عێراقەوە بە دوو قۆناغ پشکنینیان لێ ئەنجام داوە، یەکەم لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٦٧) تا کانونی دووەمی ساڵی (١٩٦٨)، دووەم لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٦٨) تا کانونی دووەمی ساڵی (١٩٦٩) کە چەندین گردی پاشماوەیی بەدەورووبەریدا بەدی دەکرێن[٦٢].

بە هۆی پشکنینەکان کۆمەڵێك کەلوپەلی شوێنەواری پڕ بایەخ دۆزراوەتەوە، لە چینەکانی خوارەوەدا ژمارەیەك مۆرو سوالەتی جۆراو جۆری تێدا بووە، کە بۆ چاخەکانی پێش مێژوو دەگەڕێنەوەو تیشکێکی زۆر دەخەنە سەر مێژوویەکی بەردەوامی ئاوەدان بوونی شارەکە، بە تایبەت لە چاخەکانی پێش مێژوودا، کە لە شوێنەکانی تری کوردستاندا ڕوون نەبووەتەوە. ئەم شارە لە چاخەکانی پێش مێژووەوە تا چاخەکانی ئاشووری نوێ (٩١١ - ٦١٢)ی پێش زایین، (ئەشکانی - پارثی) (١٢٦پێش زایین - ٢٢٦)ی زاینیی‌و ساسانی (٢٢٧ - ٦٣٨)ی زاینیی، وچاخە ئیسلامییەکان ئاوەدان بووە[٦٣].

لەنێوان چینە مێژوویەکاندا، گرنگترین پاشماوە لە چینی دووەمی سەرەوەدا دۆزراوەتەوە کە مێژووەکەی بۆ سەدەکانی ناوەراستی هەزارەی دووەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە، و هاوچاخی چینی دووەمە لە (نوزی). گرنگترین پاشماوەی ئەم چینە کۆشکێکی گەورەیە کەبە کۆشکی سەوز ناسراوە، چونکە زۆربەی بەشەکانی ناوەوەی بە ڕەنگی سەوز ڕووپۆش کراوەو لەڕووی هونەری تەلارسازییەوە، هاوشێوەی تەلارسازییەکانی نوزیە لە هەمان چیندا. بەڵام لە نوزیدا ژمارەی تەلارەکان زۆرترو مەزنترن[٦٤]. بەپێی بەڵگە دۆزراوەکانی کورووخانێ پێدەچێت ئەم کۆشکە هی کەسایەتییەکی باڵای کارگێڕی‌و کۆمەڵایەتی بووبێت[٦٥].

جگە لە پاشماوەکانی ئەو کۆشکە، ئەرشیفێکی گەورە دۆزراوەتەوە کە بریتییە لە نزیکەی ٦٠٠ تابلۆی قوڕین‌و بە خەتی مێخی‌و زمانی ئەکەدی نوسراون، ناوە کەسییەکانی دانیشتوی شارەکە خوری بوون، تابلۆکان تیشکێکی زۆر دەخەنە سەر کاروباری کارگێڕی‌و ئابووری‌و دادوەری‌و کۆمەڵایەتی ناوچەکە[٦٦]، ئەوەی جێی سەرنجە ژمارەیەکی زۆر شوێن مۆر لەسەر تۆمارەکاندا هەن، کە مۆری میتانین، بەوپێیەش ئەم شارە وەك بەشێکی دەوڵەتی (ئەراپخا)، سەر بە دەوڵەتی میتانی بووە.

*** باسی دووەم:**

**دانیشتووان:**

کەم شار لە خۆرهەڵاتی کۆندا هەبووە، کە بە شێوەیەکی تەواو دانیشتووانەکەی لەیەك ڕەگەز پێکهاتبێت، بەتایبەت لەو ناوچەیەی کەرکوکی تێدا هەڵکەوتووە، کە دەکەوێتە نێوان دوو ناوچەی سروشتی‌و شارستانییەتی جیاوازەوە، یەکەمیان لە باشوورو باشووری خۆرئاواوە، کە ناوچەیەکی گەرم‌و ووشك‌و لەڕووی کانزا سرشتییەکانەوە کەم دەرامەتە[٦٧]، دووەم لە باکوورو باکووری خۆرهەڵاتەوە، کە شاخاوی‌و ساردو بە کانزاکان، کە بۆ پیشەسازی‌و بیناسازیی جەنگی گرنگ بوون، دەوڵەمەندە[٦٨]، بەڵام بۆ دامەزراندنی دەوڵەت پێویستی بە ناوچە دەشتاییەکان بووە، چونکە ناوچە شاخاوییەکان زۆر بواری فراوان بوونی شاری گەورەیان نەداوە[٦٩]. بۆیە هەمیشە ئەم ناوچەیە بوو بووە تەوەرەی ململانێ لەنێوان دەوڵەتە گەورەکانی ناوچەی یەکەم‌و گەلانی ناوچەی دووەم[٧٠]، بۆیە مرۆڤ لە چاخەکانی پێش مێژووەوە ڕووی تێکردووە، بە درێژایی چاخە مێژوویەکان، دیاردەی کۆچکردنی ئاشتییانەو سەبازییانەو نیشتەجێ بوون لەو ناوچانەدا بەردەوام بووە، ئەوەش لە فرە ڕەگەزیی ناوچەکەدا ڕەنگیداوەتەوە.

لە کەرکوك‌و ناوچەکانی دەورووبەریدا بە درێژایی مێژوو چەندین ڕەگەزی جۆراوجۆر ڕووی تێکردووە، وەك، ئەکەدی‌و سۆمەری‌و ....تاد، لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین دا، جگە لە گەلانی ڕەسەنی ناوچەکە، وەك، سووباری، گوتی ودواتر خوری.

**١. سوباری:**

لە کۆنترین سەرچاوەکانی سۆمەری‌و بابلی‌و .....تاد، بە شێوازی جیاجیا ووشەی سوباریان تۆمارکردووە، وەك: (Subir, Šubur, Subartu)، .. تاد[٧١].

دیاریکردنی سنووری جوگرافیی سوبارتو کارێکی ئاسان نییە، چونکە ئەو زاراوەیە لە کۆنەوە بۆ ناوچەی جیاجیا هاتووە، (لوگال - ئانی - موندو - Lugal - Ani - Mundu) فەرمانڕەوای شاری (ئادەب)[٧٢] لە نیوەی یەکەمی هەزارەی سێیەمی پێش زایین دا ناوی سوبیری لەنێوان گوتیوم‌و (مارخاشی) [٧٣] لە باشووری خۆرهەڵات‌و (مارتوو سوتیوم) [٧٤] لە باکووری خۆرئاوادا بردووە[٧٥]. (ئی - ئەننانم)[٧٦] (٢٤٥٤ - ٢٤٢٥)ی پێش زایین، بە بۆنەی سەرکەوتنی بەسەر سوبارییەکاندا نەخشێکی تۆمارکردووە، (شتاینکلەر - Steinkeller)[٧٧] پێی وایە، کە بەپێی ئەو نەخشە سوبیر، لەو سەردەمانەدا ناوچەکانی باکووری دیالە تا زێی گەورە بە ئاشووریشەوەی گرتبۆوەو ناوەندەکەی (خەمازی) بووەو بە سوبارتوی تەواو ناوی بردووە، دواتر لە دەورووبەری (٢٢٠٠)ی پێش زانییدا سوبیر ناوچەیەکی فراوانتری دەگرتەوە، کە ناوەندەکەی لە خاپوردا بووە. بە پێی دەقێکی سۆمەری، گەلانی (سو)و ئیلام هێرشیان

كردۆتە سەر دەوڵەتی ئورو ڕووخاندویانە[78]، بەوپێیە دەبێ ناوچەكانیان لە لای باكوورەوە هاوسنوور بووبێت، چونكە ئیلام لەلای خۆرهەڵاتەوە بووە، هەر چۆنێك بێت، لە چاخەكانی دواتر دا تەنها ناوچەیەكی بچووكی گەیاندووەو لە هەندێ سەرچاوەدا بە (وڵاتانی سوبارتو) ناوبراوە[79].

یەكێك لە كۆنترین دانیشتووانی ناوچەكە سوباری بوون، كە دوای هاتنی ئاشوورییەكان[80] بۆ ناوچەكەو دوای داگیركردنی، بەشێكی سوبارییەكانیان بەرەو چیاكانی خۆرهەڵاتو باكووری خۆرهەڵاتی ناوچەی، كە دواتر بە ئاشوور ناسرا پاڵنا[81]، بەڵام بۆ ماوەیەكی درێژ سوبارییەكان دانیشتووانی بنەڕەتی ناوچەكە بوون، كاریگەرییان لەسەر ئاشوور بەتایبەتی لەڕووی ئاینیو ڕۆشنبیرییەوە هەر مابوو[82]. لەو سەردەمەدا، كە ئاشوور بە (بالتیل - Baltil) دەناسرا، وڵاتەكە بە سوبیر ناوبراوە. بە بۆچوونی هەندێ زانا، پاشماوەكانی (تل تایا) لە باكووری ئاشوورو (تل لیلان) لەسەر خاپورو (تل چویرا)[83] ناوەندی سەرەكی سوباری بوونو هاوتای شاری ئاشوور بوون[84].

لە ناوەكانی نوزیدا نزیكەی (٧٥٤) ناوی كەسێتی، كە تا ئێستاش بەتەواوەتی لە هیچ گرووپێكی ئیتنی ناسراودا ڕیزبەند نەكراوە[85]، لەلایەن هەندێ زاناوە بە سوباری ناوبراون، دوو برگەی كۆتایی ناوەكان دووبارە دەبنەوە[86]، وەك: (Ababa، Abubu، Akhakha، Akȟukhu، Belili، Ititi)[87] جێی سەرنجە فەرمانڕوایەكی كۆنی ئاشووری ئیتیتی كوڕی ئیاكولابا، لە نەخشێكیدا باسی لە بردنی دەسكەوت لە گاسوورەوە بۆ خواوەند ئینینی (Inini) لە ئاشوور كردووە[88]. هەمان تێبینی لەسەر ناوەكانی خواوەندانی گاسوور دەوترێت، وەك: (Dada، Dudu، Kuku، Nana، Mama، Mumu، Zuzu، Bubu)[89]. ئەو جۆرەناوانە لە ناوی پاشایانی (خەمازی)شدا هەن، (میك - Meek)[90] پێی وایە، كە ئەو جۆرەناوانە لە ناوچە شاخاوییەكانی باكوورو باكووری خۆرهەڵاتی دیجلەدا، پێش چاخی ئوری سێیەم باوبووە.

لە سەرچاوە سۆمەریو ئەكەدییەكاندا، زاراوەی سوبارتو (Subartu)[91] زۆر دووبارە بۆتەوە، (فەوزی ڕەشید)[92] پێی وایە، كە (سوو) ناوی دانیشتووانەكەیەتیو (بار) لە سۆمەریدا واتای دەرەوە دەگەیەنێت، (تو) پاشگرێكی جوگرافی سۆمەرییە، واتە (ئەو سویانەی لە دەرەوەی سنووردان). زۆرجاریش ناوە كەسییە سوبارییەكان لەگەڵ پیشەكانیاندا دەهات، وەك: ئاسنگەر، نانەوا، ....تاد، یان بە بەروبوومەكانیانەوە، وەك: جۆ، هەنجیر، هەنار، خۆخو خوری سوباری[93]. لە دەقێكی چاخی بابلی كۆندا (١٨٣٦)ی پێش زایین لە پەیماننامەیەكی ئاشووریدا[94] سوێند بە خواوەندێكی سوبارتو خوراوە[95].

**٢. گوتی:**

لە سەرچاوە سۆمەریو ئەكەدییەكاندا بە ڕێنوسی جیاجیا ناوی گوتییەكان براوە، وەك: گوتی (Guti)، قوتی (Quti)، كوتی (kuti). بەو پێیەش زیاتر گۆڕانەكان لە برگەی یەكەمدا هاتووە، جارجارەش پاشگری (پ)و (ب)ی بۆ زیادكراوەو بۆتە گوتوبوم، كە پاشگرێكی كۆی ئیلامییە[96].

بە پێی سەرچاوە مێخییەكان، زۆر جار سنووری گوتی هەڵكشانو داكشانی بەخۆوە بینیوە، تادەوڵەت كۆنترین ئاماژە بۆ گوتی، بۆ لوگال - ئانی - مندو لە نیوە یەكەمی هەزارەی سێیەمی پێش زایینیدا دەگەڕێتەوە، كە بە هۆی بوونی پاشگری (ki)یەوە وەك زاراوەیەكی جوگرافی دەزانرێت، بەو پێیەش گوتیوم دەكەوتە نێوان ڕووباری دیالە - سیروان لەلای باشوورو زێی بچووك لەلای باكوورەوە[97]. لە دەقێكی جوگرافی سارگۆنی ئەكەدیدا، كە كۆپییەكی سەرەتای هەزارەی دووەمە، سنووری دەوڵەتەكەی لە باكوورەوە گەیشتۆتە دەورووبەری داقوقی دەوڵەت، بەو پێیەش سنووری دەوڵەتی ئەكەدی لە باكوورەوە لەگەڵ گوتیوم دراوسێ بووە، لە دەقێكی تری ئەكەدیدا وەك ناوچەیەكی شاخاوی وەسفی شوێنی گوتییەكان كراوە[98]. هەر چۆنێك بێت، ناوچە گوتی نشینەكان زیاتر لە ناوچەكانی نێوان دیالە - سیروان تا زێی بچووكی گرتۆتەوە.

گوتییەكان، دوای ئەوەی ماوەی نزیكەی (١٠٠) ساڵ فەرمانڕەوایەتی وڵاتی ئەكەدیان كرد، ناوەندیان بەرەو ناوچەكانی (ئەراپخا) گواستەوە[99]، لە ئەرشیفەكانی شاغر بازار لە خاپور، كە بۆ چاخی بابلی كۆن دەگەڕێتەوە، چەند ناوێك دۆزراوەتەوە، وەك: تریكان، كە پاشایەكی گوتی هەمان ناوی هەبووە[100]. هەر لەو سەردەمەدا لە دەقەكانی (شمشارە) و (ماری)دا وەك هێزێكی كاریگەر ناوبراون. (حەموراب)یش (١٧٩٢ - ١٧٥٠)ی پێش زایین، ناوی گوتییەكانی لەگەڵ گەلانی تردا بە زمان ئالۆزو دوور ناوبردووە[101]. دواتر (تكلات - پلیزری یەكەم) (١١١٥ - ١٠٧٧)ی پێش زایین پاشای ئاشووری لە میانەی لەشكركێشییەكانیدا بۆسەر ناوچەكانی زێی بچووك - دوكان، ناوی چەند شوێنێك دەهێنێت پێدەچێت گوتی بووبێتن[102].

ئەگەر بڕوانینە سەرچاوە دەرەكییەكان، كە ناوی گوتییان بردووە، وا دێتە بەرچاو هیچ بنەڕەتێك بۆ گوتییەكان نەبێت، لە دەقەكانی ئەكەدیدا، وەك هەژدەها، یان وەك ئامرازێكی سزای خواوەندان بە سەر پاشایان ناو دەبرێن[103]. بەڵام لە چەند دەقێكی پاشایانی گوتیداو وەك (لائیراب)و ئیریدوپیزیردا، خۆیان بە پاشای گوتیوم[104] ناو دەبەن. ئەوەش دەیسەلمێنێت، كە بەلای كەمەوە گوتیوم، زاراوەیەكی جیو - سیاسی بووە، بەڵام بەدرێژایی مێژوولە سەرچاوەكاندا گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

**٣. خوری (Ĥu - ur - ri):**

*** ڕەگەز:**

خوری[١٠٥] یەکێك بوون لە گەلانی خۆرهەڵاتی نزیکی کۆن، کە لە سەرچاوە مێژووییەکاندا[١٠٦] ناوبراوەو ڕۆڵی سیاسی و شارستانی کاریگەرییان لە ناوچەکەدا بینیوە، بە تایبەت لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زایینیدا. لەو چاخەدا توانیان زۆربەی ئەو وڵاتەی کە بە سوبارتو، گوتیوم و ....تاد ناسرابوو، بخەنە ژێر کارگەریی شارستانیی خۆیانەوە، کاتێك کە لە سایەی دەوڵەتی میتانیدا، بۆ یەکەم جار یەکێتییەکی سیاسیان پێکهێنا (وەك لە سەرچاوەکاندا بە ڕوونی باسکراوە). هەرێمی (ئەراپخا)، کە (نوزی) ناوەندێکی گرنگی بووە، بەشی خۆرهەڵاتی ئەو دەوڵەتە بوو.

لە سەرچاوە مێخییەکانەوە زانراوە، خوری لە بنەڕەتدا لە ناوچەکانی باکووری خۆرهەڵاتی وڵاتی ئاشووردا بوون[١٠٧]، لە قەفقاس[١٠٨] یان لە ناوچەکانی دەریاچەی وان، کە دواتر بە ئەرمینیا ناسرا، هاتوون، تا زنجیرە چیاکانی تۆرۆس و کەرکەمیش[١٠٩] لە خۆرئاواوە، لە باشوورەوە زێی گەورە[١١٠] و تەنانەت تا زێی بچووك[١١١] نیشتەجێ بوون.

لە سەرەتای توێژینەوە لە خورییەکان بیرو ڕای جیاواز لەنێوان مێژوونووساندا سەری هەڵداوە. هەندێ لە مێژوونووسان لەگەڵ سوباریدا جیایان نەدەکردنەوەو بە کۆنترین دانیشتووانی ناوچەکانی سوبارتویان دادەنا، بەتایبەتی (ئارثر ئەنگەناد – Arthur Unganad)[١١٢] هۆی ئەوەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی، کە زۆر جار ناوە کەسێتی و جوگرافییەکانی خوری و سوباری بەیەکەوە دەهات، بەتایبەت لە دەقە سۆمەری و ئەکەدییەکاندا[١١٣]. بەڵام دواتر (گێلب – Gelb)[١١٤] سەلماندی، کە سوباری و خوری دوو زاراوەی (ئیتنی – زمانەوانی) جیاوازن، تەنانەت سوباری یان سوبارتو، لە سەرچاوەمێخییەکاندا بەواتایەکی جوگرافی بۆ وڵاتی (بەرز)[١١٥]، یان باکوور[١١٦] بووە، نەك وەك ڕەگەزێکی دیاریکراو.

لەلایەکی ترەوە بە هۆی پەیوەستکردنی هەندێ لە چیرۆکەکانی (نوزی) دەربارەی ئافراندن بە چیرۆکەکانی تەورات و دۆزینەوەی جۆرێك لە سواڵەت لە (خربە کرك)[١١٧]، بەتایبەت لە هەندێ توێژینەوەی ئەمریکییەکاندا، بۆ دەرکەوتنی خورییان دەگێڕایەوە، کە لەڕووی کرۆنۆلۆجیا و توێژینەوەی زانستییەوە هیچ بنەمایەکی نییە، هەروەها زێدەڕۆیی لە بوون و ڕۆڵی (هیندو – ئارییەکان)[١١٨] لە ناوچەکەدا کراوە، کە بەڕای (ڤیلهێلم – Wilhelm)[١١٩]، ئەم بابەتە بۆ بەهێزبوونی بزوتنەوەی نازی لەناوەڕاستی سەدەی ڕابردوودا دەگەڕێتەوە.

*** زمان:**

خوری وەك گەلێکی خاوەن زمان، و داب و نەریت، و خاوەن سیما و پێکهاتەی ئەنترۆپۆلۆجیای جیاکراوە[١٢٠]، کە توانیویەتی دوو هەزارساڵ خۆی لە لەناوچوون بپارێزێت ورەوتی مێژوویی خۆی هەبێت و کاریگەری بخاتەسەر گەلانی دەوروبەری[١٢١]. بۆیە لەبوارەکانی ڕەگەزو زمانەوانییەوە ناچێتەوە سەر هیچ زمانێکی پۆلێنکراو، وەك: سۆمەری، سامی و هیندۆ – ئەورووپی[١٢٢]، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە زانایان ناوی گەلانی ئاسیایی ڕەگەزیان لێبنێن[١٢٣].

بە پێی هەندێك توێژینەوە زمانەوانییەکان، تادەوڵەت تەنها پەیوەندی نێوان زمانی خوری[١٢٤] لەگەڵ زمانی (خالدی)دا[١٢٥] بەتایبەتی لە ڕووی وشەسازییەوە سەلمێنراوەو تارادەیەك خزمایەتی نێوانیان هەبووە. بەڵام بەپێی چەند توێژینەوەیەك زانراوە، کە هەردووزمانەکە لە سەردەمانێکی هەزارەی سێیەمەوە لەیەکتر دابراون، بۆیە زمانی (خالدی)[١٢٦] لە ئەنجامی گەشەسەندنی مێژوویی زمانی خوری دەرنەکەوتووە، چونکە هەردوو زمانەکە دوای ئەو دابرانە، ڕێچکەی تایبەتی خۆیان گرتەبەر. هەوڵەکانی (دیاکۆنۆف) بۆ پەیوەست بوونی زمانی خوری و خالدی بە دیالێکتەکانی قەفقاسەوە سەرەڕای بەکۆتایی نەگەیشتنی جێی بایەخ بووە[١٢٧]، هەر چەندە شتێکی ئەوتۆ لە بارەی زمانەکانی گوتی و لولویی نەزانراوە، بەڵام بەهۆی نزیکی و تێکەڵی ناوچەکانیانەوە، بەتایبەتی لە نوزیدا پەیوەندی لەنێوانیاندا دروست بووە[١٢٨].

زمانی خوری لەهەزارەی سێیەمەوەو بەتایبەتی لەسەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زاییندا لە بەشێکی بەرفراوانی (هیلال ئەلخەسیب)دا قسەو نووسینی پێکراوە، کە ناوچەکانی باکوورو باکووری خۆرهەڵاتی عێراق، باکووری سووریاو باشووری خۆرهەڵاتی تورکیا (کوردستان) دەگرێتەوە، کە لە کۆنەوە بە سوبارتوو دواتر بە میتانی ناوبراوە. سەرەڕای دابەشبوونی خوری بەسەر چەندین هەرێمی جوگرافی جیاوازدا، توانیویەتی وەك زمانێکی سەربەخۆ خۆی بپارێزێت[١٢٩]، بەڵام دەتوانین بۆ دوو زاراوەی سەرەکی، کۆن و نوێ دابەشی بکەین[١٣٠]. ئەم زمانە تا کۆتاییەکانی تۆمارە ئاشوورییەکان لە ناوچەکانی زێی بچووك تا دەریاچەی (وان) بەردەوام بووەو ناوەکەسییەتییە خورییەکان بەکارهاتوون[١٣١]. ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی پاشماوەی ناوو هەندێ پاشگری خوری، لە ناو زمانی کوردیدا بمێنێتەوە[١٣٢].

*** دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی خوری لە مێژوودا:**

زانراوە کە خوری لە سەردەمانێکی زۆرکۆنەوە[١٣٣]، لە ناوچەکانی دەریاچەی (وان) وبەرەو خۆرئاوا تا دەگاتە رووباری دیجلە بڵاوبوو بوونەوە، لە تۆمارەکانی (ئێ – ئەننانم)ی پاشای بنەماڵەی یەکەمی لەگەشدا لەگەڵ سوباریدا[١٣٤] ناوبراون[١٣٥]، و دواتر لە ناوچەکانی باکووری زێی گەورە رووبەرووی پاشایانی ئەکەدی بوونەتەوە[١٣٦]. راو بۆچوونی جیاواز دەربارەی بڵاوبونەوەی خوری، بەتایبەت بەرەو خۆرئاوای رووباری فورات، دەربارەی بوون و نەبوونی خوری لەوناوچانەدا پێش چاخی بابلی کۆن هەیە، چونکە بەپێی هەندێك سەرچاوە پاشماوەکانیان لە، (شاغربازار – Shagharbazar)و[١٣٧] (تەل بەراك) [١٣٨]و (ئێبلا)دا، نەدۆزراوەتەوە[١٣٩]. بەڵام بە پێی پشکنینەکانی (پێتیناتۆ – Pettinatu) لە ئێبلادا ناوی چەند مانگێکی سالنامەی خوری[١٤٠] دۆزراوەتەوە[١٤١].

سەبارەت بە رووداوە مێژووییەکان، کە لە چاخی ئەکەدییەوە روونتر دەبێتەوە، بەتایبەتی لە دوای دەسەڵاتی (سارگۆن) [١٤٢]، چونکە پێش ئەوە زۆر روون نیە. بەڵام لە سەردەمی (نرام – سن)ەوە (٢٢٥٤ – ٢٢١٨)ی پێش زایین خوری وەك خاوەن یەکەی سیاسی دەرکەوتووە، (نرام – سن) لە سەرەتای هاتنە سەر دەسەڵاتیدا بۆ خامۆشکردنی راپەرنێکی سەرتاسەری لە سوبارتودا، دەستی دایە لەشکرکێشییەکی فراوان، لە شوێنێکدا بەناوی (ئەزوخینوم) [١٤٣]، رووبەرووی هێزێکی خوری بۆوە، ناوی سەرکردەکەیان (تاخیش – ئەتال – Tah̯iš - atal)، ناوی شوێن و کەسەکەش خوریە[١٤٤]. پاشایەکی شیموروم بەناوی پوتیم – ئەتەل (Putim - atal) لە ناوچەکانی نێوان دیالە – سیروان و زێی بچووکدا[١٤٥] یەکێك بووە لەو فەرمانرەوایانەی ناوچەکە، کە رووبەرووی (نرام – سن) بۆتەوە، بە ناوەکەیەوە دیارە خوری بووە[١٤٦]. لە دوای ئەم پاشایەدا چەند پاشایەکی تر هاتنە سەر تەخت کە نەیانتوانی شکۆی دەوڵەتەکە بپارێزن و بووە هۆی بەهێزبوونی گەلانی ناوچەکە، وەك، خوری، ئەوە بوو دەوڵەتی (ئورکیش – Urkeš)[١٤٧] وەك دوڵەتێکی سەربەخۆ سەری هەڵدا، کە پاشایەکیان بە ناوی (ئەتەل – شین –AtalŠin)[١٤٨] لەسەر تابلۆیەکدا دەقێکی بە بۆنەی بنیاتنانی پەرستگایەك بۆ خواوەند نرگال تۆمارکردووە کە تێیدا هاتووە: (ئەتەل – شین پاشای ئورکیش وناوار[١٤٩])[١٥٠]. پاشایەکی تریش بەناوی (کیکلب – ئەتەل) نازناوی (پاشای توکریش)ی[١٥١] لە خۆی ناوە[١٥٢]. لەمەوە روون دەبێتەوە کەوا خوری لەو سەردەمەدا سەربەخۆ بوون. هەر چەندە ناتوانرێت بە ووردی مێژووو شوێنی ئەو دەوڵەتانە دیاری بکرێن، چونکە سەردەمی دوای ئەکەدی زۆر روون نییە، بەڵام بەهۆی لەناوچوونی دەسەڵاتی ئەکەدی، خورییەکان لەکۆتایی سەردەمی ئەکەدی، یان سەرەتای سەردەمی گوتی، لە ناوچەکانی خۆرهەڵاتی دیجلەدا (لەناوچەکانی سەرووی دیجلە لە باکوورەوە تا دیالە لە باشوورەوە) بڵاو بوو بوونەوە.

بە پێی بەڵگە شوێنەواری و مێژووییەکانی چاخی بنەماڵەی سێیەمی ئور (٢١١٢ – ٢٠٠٤)ی پێش زایین، بەتایبەت لە دەقە ئابووری و کارگێرییەکاندا[١٥٣]، زۆربەی دانیشتووانی ناوچەکانی باکوور و خۆرهەڵاتی دیجلە خوری بوون، چونکە زۆربەی ناوی کەسی و شوێنە جوگرافییەکان و نێردەو فەرمانرەوا ناوخۆییەکانی ئەو ناوچانە، خوری بوون[١٥٤]، و هەر لە زیادبووندا بوون[١٥٥]، بە تایبەت لە شارە سۆمەرییەکاندا[١٥٦]، چونکە لەو چاخەدا زیاتر لەشکرکێشی پاشایانی ئەم بنەماڵەیە بۆ سەر ناوچەکانی (ئەراپخا)، (ئۆربیلوم)[١٥٧] (هەولێری دەوڵەت)و (شوشرا – شمشارە) بووە[١٥٨].

بە رووخانی دەوڵەتی بنەماڵەی سێیەمی ئور، تۆمارەکان وەستان، بەتایبەت لە میسۆپۆتامیادا، بۆیە بۆ بارودۆخی ئەو سەردەمە پشت بە تۆمارەکانی (کول تەپە)[١٥٩] دەبەسترێت. لەو دەقانەدا پاشماوەی خوری دۆزراوەتەوە، بەتایبەت ناوە جوگرافی و کەسێتییەکان[١٦٠] و بەپێی بەڵگەکانی ئەو سەردەمانەی (ئەنادۆل)، دەردەکەوێت کە خوری بە درێژایی ئەنادۆڵ، هاوتای بازرگانە ئاشوورییەکان، بازرگانیان کردووە[١٦١] و بە شێوەیەکی بەربڵاو نیشتەجێ بوو بوون، بەڵام نەبووە هۆی کۆنترۆڵ کردنی ناوچەکان، چونکە گەلانی تریش هەبوون، وەك، خاتی، پالی، لوڤی[١٦٢] و.. تاد[١٦٣]. بەڵام بە گەرانەوە بۆ رووداوەکانی دواتر ئەم راستییە زیاتر پشتراست دەبێتەوە، بە تایبەت رۆڵی خوری لە کۆتایی هێنان بە کۆلۆنیە بازرگانیە ئاشوورییەکاندا، پاشان فراوان بوونەوەیان بەرەو خۆرئاوا پەرەی دەسەند[١٦٤]. بەو پێیە خوری لەو چاخەدا خاوەن هێزو دەسەڵاتی سیاسی بوون.

لە چاخی بابلی کۆندا (١٩٠٠ – ١٥٩٥پێش زایین)[١٦٥]، بەتایبەت لە کۆتایی سەدەی هەژدەی زایینیدا، پاشماوەکان بە گشتی لە ناوچەکانی خۆرئاوای دیجلەدا روونتر دەبنەوە، وەك، لە پاشماوەکانی (شاغربازار)[١٦٦]، ماری[١٦٧] و(تەل ئەلرماح)[١٦٨]، لە خۆرئاواوە تا (ئالالاخ)[١٦٩]، توانراوە بە شێوەیەکی زۆر فراوان پاشماوەی جۆراو جۆری خوری بدۆزرێتەوە[١٧٠]. لە خۆرهەڵاتەوە لە ناوچەکانی بتوێنێدا کۆمەڵگەی خوری زۆر پێشکەوتبوو، بە تایبەت لە (شمشارە)دا، کە ناوەندێکی کارگێری خوری بووەو فەرمانرەوایەکی بە هێز بەناوی (کوواری) فەرمانرەوایەتی کردووە[١٧١]، لەو سەردەمانەدا چەندین هێزی سیاسی سەری هەڵدا، کە بە هێزترینیان هۆزەکانی (توروکوی) خوری بوو[١٧٢]. رێی تێدەچێت کە دوای ئەو سەردەمەوە ئاشووریش کەوتبێتە دەستی خوری، یان بەلای کەمەوە لەوێدا بڵاوبووبن، چونکە تۆمارەکانی ئاشوور لەدوای (شمشی – ئەدەد)و (ئیشمی – داگان)ەوە وەستاو لە دوای سەدەیەکەوە بۆماوەی سەدان ساڵی تر، جگە لە ناوی پاشاکانیان، هیچ زانیارییەکی تر دەربارەی پاشایانی ئاشوور نەزانراوە[١٧٣].

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە رووداوێکی گرنگ روویداو تا دەوڵەتش مایەی توێژینەوەی زانایانە، ئەویش مەسەلەی هێرشی (هیکسۆس)ە[١٧٤] بۆ سەر باکووری میسر، بەپێی بەڵگە شوێنەوارییەکان خوری رۆڵی لەو رووداوەدا هەبووە،

لە دوو چینی شوێنەواری پاشماوەی (هیکسۆس)ەکان لە میسردا (١٧٨٠ - ١٥٧٠)ی پێش زایین، لە چینی دووەمدا مۆرکی خوری بەروونی جیادەکرێتەوە، چ لە رووی ناوە کەسێتییەکان، یان لە بواری ئاین و هونەر. دوای سەدەیەك فیرعەونەکان بە ناوچەکانی (سوریاو فەلەستین)یان وتووە (خارو) چونکە خورییەکان لەو ناوچانەدا نیشتەجێ بوو بوون، ئەوەش بۆ سەردەمی هیکسۆس دەگەڕێتەوە[١٧٥].

سەرچاوەیەکی گرنگی تر سەبارەت بە خوری، لەشکرکێشی مورسیلی یەکەمی (١٦٢٠ - ١٥٩٠)ی پێش زایین پاشای هیتییە، کە لە نزیکەی (١٥٩٥)ی پێش زایینیدا[١٧٦] دوای داگیرکردنی شارەکانی حەلەب و ئالالاخ و چەندین شوێنی تر کە زۆر لە سەرکردەکانیان خوری بوون[١٧٧]، رووی کردە بابل و بە درێژایی فوراتدا شۆڕبۆوە، تا گەیشتە بابل و پاش لەناوبردنی دوا پاشای بابل، شارەکەی وێران کرد، بەڵام بە هۆی رووداوێکی کوتوپڕ (مورسیلی) بەرەو خاتوشای پایتەختی خاتی کشایەوە[١٧٨].

ڕاستەوخۆ دوای ئەو رووداوانە کاشییەکان[١٧٩] ئەمەیان بەهەل زانی و دەستیان بەسەر شاری بابلدا گرت. وەك زانراوە خوری لەو سەردەمەدا زۆر کاریگەر بوون، چونکە رۆڵێکی گەورەیان بینیوە لە پاڵپێوەنانی کاشی بەرەو باشوورو وەرگرتنی دەسەڵات لە بابل، وەك لە خۆرئاواوە لە هێرشی (هیکسۆس)دا رۆڵیان بینیبوو[١٨٠].

خوری لە هەزارەی دووەمی پێش زایینەوە بەشێوەیەکی زۆر بڵاوبوونەوە، بەڵام لەناوەراستی هەزارەدا گەیشتە ئەوپەڕی فراوانبوونیان، چونکە لەو سەردەمەوە پاشماوەی ماددی و نوسراوەیی خوری لە زۆر ناوچەدا، کە پێشتر جێی گومان بوون، روون بووەوە، وەك: ناوچەکانی (ئەراپخا)، زنجیرە بەرزاییەکانی حەمرین لە باشوورەوە، (ئۆگاریت)[١٨١] لە خۆرئاواوەو لە باکوورەوە تا وڵاتی (ئیشووا) و[١٨٢] (کیززواتنا)[١٨٣]، لە باکووری خۆرهەڵاتی دەریای ناوەڕاست[١٨٤].

بە پێی بەڵگە ماددییەکانی (نوزی)و شوێنەکانی تری (ئەراپخا)، زۆرینەی دانیشتووانی هەرێمەکەو بەتایبەتی (نوزی)، خوری بوون، لەو سەردەمەدا شانشینێك سەری هەڵدابوو کە زۆرینەی ناوە کەسی و بنەماڵە فەرمانڕەواکانی خوری بوون. لە دەورووبەری کۆتایی سەدەی شانزەی پێش زایینیدا، دەوڵەتی میتانی لەناوچەکانی نێوان دیجلە لە خۆرهەڵات و فورات لە خۆرئاواوە، سەری هەڵدا کە ناوەندەکەی لە سێگۆشەی خاپوردا بوو، دوای نیوەی یەکەمی سەدەی پانزەهەمی پێش زایینیدا، هەموو ناوچە خوری نشینەکانی خستە ژێر رکێفی خۆیەوە[١٨٥]. ئەوەش وایکرد کۆمەڵگەی خوری لە هەموو روویەکی شارستانییەوە گەشە بکات و جێگیر ببێت.

بەو شێوەیە خوری بەشی هەرەگرنگی دەوڵەتی میتانی بوون، تا گرتنی ناوچەکانی میتانی لەلایەن هیتی و ئاشوورەوە لە کۆتایی سەدەی سیانزەی پێش زایینیدا، تا سەدەی یانزەی پێش زایینیدا ناوی چەند فەرمانڕەواو ناوچەی جوگرافیی خوری لە تۆمارە ئاشوورییەکاندا بەردەوام بوو، خوری وەك کۆمەڵگەو زمان لەناوچە جیاجیاکانی سەرووی زێی بچووك و باشووری دەریاچەی (وان)دا تا کۆتایی تۆمارەئاشوورییەکان، لە سەدەی حەوتەمی پێش زاییندا بەردەوام بوو[١٨٦].

* ئاین:

خورییەکان، بەشێوەیەکی فراوان لە چەندین ناوچەی جیاوازی جوگرافی و شارستانیدا بڵاوبوونەوە، ئەوەش بۆتە هۆی یەکانگیر نەبوون و هاوشێوە نەوبوونی بیرو باوەڕو رێوشوێنی ئاینیی خوری. لەو چەندین خواوەندەی، کە خورییەکان دەیان پەرستن ژمارەیەکیان لەو ناوچە تازانەدا وەرگرت کە لێی بڵاو ببوونەوە، دواتر لەگەڵ کۆمەڵە خواوەندانی خۆیاندا دەیانگونجاند[١٨٧].

کۆمەڵەی خواوەندانی خوری چەندین خواوەندی لە خۆگرتبوو، خواوەند تیشوپ پاشای خواوەندان بوو، کە بە خواوەندی کەش[١٨٨] ناسراوە، ناوەندی سەرەکی پەرستنی لە شاری (کومی – Kumme / Kummija)[١٨٩] بووە، بۆیە نازناوی (پاشای کومیا)ی لێنرابوو[١٩٠]، لە (ئەراپخا) ونوزیدا گرنگی زۆری هەبووە، برگەی دووەمی ناوی هەموو پاشایانی (ئەراپخا)ی پێکهێنا بوو، وەك: کیپی – تیشوپ، ئیتخی – تیشوپ، خیشمی – تیشوپ و موش – تیشوپ (موشتیا[١٩١])، پایەی لە دەوڵەتی میتانیدا زۆر بەرز بووەو (توشراتا) وەك سەروەری وڵات و بە هاوتای ئامونی خواوەندی میسری ناوبردووە[١٩٢]. هەروەها، لە چەندین شاری تردا پەرستراوە وەك: شاغربازار، ماری، ئۆگاریت، کەرکەمیش و ئالالاخ و بوغازکۆیدا وەك خواوەندی باوبۆران پەرستراوە[١٩٣].

خواوەند (خیپات – Ĥepat)ی خێزانی تیشوپ، خواوەندێکی تری گرنگی خوری بووە[١٩٤]، ئەم خواوەندە زیاتر لە ناوچەکانی باکووری سوریادا پەرستراوە، چونکە پاشماوەی پەرستگاکانی لەو ناوچانەدان، کە لە خۆرئاوای دیجلەدان، لەگەڵ ئەوەشدا لە ناوە کەسییەکانی نوزیدا، هەیە، وەك: شوەر – خیپات و شەتور – خیپات، کە خزمی میرێکی (نوزی) بوون. ناوی دوو کچە شازادەی میتانی، کیلو – خیپات و تادو – خیپات بوون، کە لە لووتکەی کۆمەڵگای خوریدا بوون[١٩٥].

خواوەند (شەوشکا – عەشتار)ی خوری پلەیەکی باڵای لە کۆمەڵەی خواوەنداندا هەبووە، خوشکی تیشوپ بووە، لە چاخی ئوری سێیەمەوە ناوی براوەو زۆر جار بە (عەشتار)ەوە لکێنراوە، بەتایبەت لە نەینەواو لە خۆرهەڵاتی دیجلەدا، لە دەوڵەتی میتانیدا پایەیەکی بەرزی هەبووە[١٩٦]، ئەم خواوەندە بەوە ناسرابوو، کە توانایەکی بە هێزی لە چاکبوونەوەی نەخۆشیدا هەبووە[١٩٧]، لە نوزیدا پەرستگایەکی گەورەی هەبووە، ساڵانەش بە بۆنەی نۆژەنکردنەوەی پەرستگەکە ئاهەنگیان گێڕاوە[١٩٨]، پێدەچێت خواوەند (تیشوپ)یش لە هەمان پەرستگادا پەرسترابێت، هەروەها لە (ئەزوخینا)و (کورووخانی)دا پەرستراوە[١٩٩].

کوماربی، خواوەندێکی تری کۆمەڵە خواوەندانی خوری بووەو زۆربەی چیرۆکە ئەفسانەییەکانی خوری لە دەوری ئەم خواوەندەدا دەخولێتەوە. ئورکیش لە هەزارەی سێیەم پێش

زاییندا مەڵبەندی سەرەکی خواوەند کوماربی بوو، بۆیە نازناوی (سەروەری ئورکیش)ی لێنرا بوو[٢٠٠].

خورییەکان بە درێژایی مێژوویان چەندین خواوەندیان وەرگرتوە، یەکێك لەوانە، (نیرگال)ە، کە پێدەچێت وەرگیراو بووبێت، بەڵام شوێنی بنەڕەتی ئەم خواوەندە نەزانراوە، ئەتەل - شینی پاشای ئورکیش، بە بۆنەی بنیاتنانی پەرستگایەك بۆ نیرگال[٢٠١] نەخشێکی تۆمارکردووە، ئەوەش نیشانەی بەرزڕاگرتنییەتی. لەگەڵ ئەوەشدا لە تۆمارە خۆرئاواییەکانی خوریدا نەهاتووە، بەڵام لە دەقە خوری - هیتییەکاندا بە شێوازە باوەکەی (iR.Gir - ri) یان (UNU - ĝal) نەهاتووەو نەزانراوە، ئایا مەبەست لە هێما سۆمەرییەکەیەتی (U.GUR)، یان هەر هێمای (Ugur)ی دەقەکانی (ئەراپخا)یە؟[٢٠٢]. یەکێك لە خواوەندانی تر (تیللا) یە، کە لە پێکهاتەی ژمارەیەکی زۆری ناوە کەسییەکانی ناوچەکانی (نوزی)و (ئەراپخا)دا هەیە[٢٠٣]. چەندین خواوەندی تر، کە لێرەدا بواری باسکردنیان نییەو بە پلەی لاوەکی، لە دوای خواوەندانی سەرەوە دێن، وەك: ئایا، نیکال، شیمیك، کوشوخ، و.. تاد[٢٠٤].

### * باسی سێیەم:

### کەرکوك لە کۆنەوە تا کۆتایی هەزارەی سێیەمی پ.ز:

#### ١. چاخەکانی پێش نووسین:

ئاسان نییە سەرەتای بنیاتنان، یان ئاوەدان بوونی شارێکی وەك کەرکوك دیاری بکرێت، چونکە مێژووی ئاوەدان بوونی ئەم شارە بۆ چاخەکانی پێش مێژوو دەگەڕێتەوە، کە تێیدا هیچ تۆمارێك نەبووە، بۆیە پێویستە پاشماوەی شوێنەوارە مادییەکان شیبکرێنەوە. ئەو شوێنەوارانەی کە چاخ لەدوای چاخ کەڵەك بوون و بە پێی هەر سەردەمێك تایبەتمەندێتی خۆیان هەبووەو پەرەیان سەندووەو لە چوارچێوەی ئەو شارستانییەتەوە دەتوانرێت بارودۆخی گشتی شارەکان روون بکرێتەوە.

زانراوە کە مرۆڤ لە دێر زەمانەوە لە ئەشکەوتی چیاکانی کوردستاندا ژیاوە، ئەوەش بۆ لە باربوونی بارودۆخی ژینگەی سروشتی دەگەڕێتەوە، کە بۆ خۆپاراستن لەسەرمای زستان و گەرمای هاوین و درندە لەلایەك و لەلایەکی ترەوە سادەیی ژیانی مرۆڤ بەتایبەتی لەڕووی ئامێرە بەکارهێنراوەکان. چونکە ئەشکەوتەکان تاکە پەناگەی حەوانەوەو خۆپاراستن بوون. هەر بۆیە پشتیان بە کۆکردنەوەی خۆراك دەبەست، وەك لە ئەشکەوتەکانی شانەدەر، هەزارمێرد وزەرزی، و....تاد بەدی دەکرێن، ئەم چاخە بە چاخی بەردینی کۆن ناسراوە[٢٠٥].

بە پێی شوێنەوارە مادی و شیکارییە کیمیاوییەکانەوە سەلمێنراوە، کە رەوتی ژیانی مرۆڤ بەرەو پێش دەچوو، بەڵام زۆر لەسەرخۆو بە هێمنی بووە، تا نزیکەی (١٢ - ٩) هەزار ساڵ پێش زایین و دواتر مرۆڤ پێی ناوەتە قۆناغێکی تری ژیان، کە لەلای شوێنەوارناسان بە چاخی بەردینی نوێ ناسراوە (٩٠٠٠ - ٥٥٠٠)ی پێش زایین، بەپێی پشکنینەکان، ئەم پەرەسەندنانە بەهۆی گۆڕانێکی گەورە لە ژینگە، بەتایبەت کشانەوەی بەستەڵەکی باکوور روویانداوە[٢٠٦]، مرۆڤ وورددەوورده لە ئەشکەوتەکانەوە هاتووەتە دەرەوەو بەرەو دۆڵ و دەشتاییەکان شۆڕبۆتەوەو هەوڵێکی سەرەتایی بۆ پەروەردەکردنی ئاژەڵ و چاندنی دانەوێڵە داوە، وەك زاوی چەمی و پاڵی گەورە[٢٠٧]. بۆیە ئەم ئاواییە سەرەتاییانە بۆ چاخێکی روونتر رێخۆشکەر بوون، کە بە شۆڕشی کشتوکاڵ ناسراوەو مرۆڤ لە گوندی جێگیر گیرساوەتەوەو چاندن و ئاژەڵداری ئەنجام داوە، وەك: کەریم شایەر، پاڵە گەورە[٢٠٨]و چەرموو لە خۆرهەڵاتی کەرکوك، و(مەتارە) لە باشوورییەوە، و شمشارە لە دەشتی رانیەو هەروەها حەسونە[٢٠٩]. چونکە ئەو ناوچانە بارودۆخێکی گونجاوی بۆ کشتوکاڵ دەرەخساند، چ لە رووی رێژەی باران بارین بۆ کشتوکاڵ بێت، یان لە رووی تۆبۆگرافیای ناوچەکە، کە بواری بنیاتنان و فراوان بوونی گوندەکانی زیاتر دەکرد[٢١٠].

پەرەسەندنی ئامێرە بەکارهاتووەکان و کشانەوەی ئاوی رووبارەکان، کە بەهۆی ووشکە ساڵییەکانەوە روویداوە، پاڵی بە دانیشتووانەوە ناوە زیاتر لە لێواری رووبارەکاندا کۆببنەوە[٢١١]و سوود لە ئاودێری ببینن، ئەمەش وایکرد کە کۆمەڵگاکان لە خاڵێکدا کۆببنەوە، لەلایەکی ترەوە بنیاتنانی پەرستگاکان پەرەسەندنی ئاواییەکان هۆیەکی تری بوون، تابوونە بەردی بناغەی شارە کۆنەکان[٢١٢]. ئەم دیاردانەش لە پاشماوەکانی (نوزی)، داقوق لە باشوورییەوە، نەینەواو تەپەگەورە لە خۆرئاواوە[٢١٣]، بەڕوونی لە کنەو پشکنینەکاندا سەلمێنراوە، کە بۆ هەزارەی شەشەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە[٢١٤]، کە بە چاخی حەسونە ناسراوە. لە چینی (١٢ - ١١)ی خوارەوەی نوزیدا کەلوپەلی چاخی حەلەف[٢١٥] دۆزراوەتەوە[٢١٦]. لەچاخی (عوبێد)دا پاشماوەکانی گۆڕی منداڵ لە چینی (١٠)دا دۆزراتەوە[٢١٧] لە چینی (٨)دا تەنورو ئاگردان دۆزراوەتەوەو بۆ چاخی (گەورە - نەینەوا) دەگەڕێتەوە، هەروەها لەدوای ئەم چاخەوە شوێنەواری مۆری تەخت لە خۆرهەڵاتی دیجلەدا دۆزراونەتەوە، کە وێنەی ئاژەڵ و نەخشی ئەندازەیی لەسەردایە[٢١٨]. جگە لە ملوانکەی بەردی بە نرخ، کە ئەمانە مۆرکێکی ئاینیان پێوەدیارە[٢١٩].

دۆزینەوەی گۆڕەکان، کە بە شێوازی جیاواز نێژراون، دەکرێت بە نیشانەی جیاوازی کۆمەڵایەتی لێك بدرێتەوە کە پلەی ئابووری و کۆمەڵایەتی پێوەدیارە، مۆرەکانیش ئەو بۆچوونە دووپات دەکەنەوە، چونکە لە سەرەتاوە مۆرەکان لەلایەن پەرستگاو خاوەن موڵك و پایەدارەکان بەکارهاتوون، لایەکی تریشەوە کنەو پشکنینەکان سەلماندویانە کە جیاوازی لە شێوازو قەبارەی تەلارو خانووەکانی ناوچەکەدا بەدی کراوە، بەتایبەت لە پاشماوەکانی تەپەگەورە، ئەوەش بەڵگەی بوونی فەرمانڕەواو جۆرێك لە کارگێڕی دێت لەلایەن کەسانێکەوە، بۆ پەیوەندی ئاڵوگۆڕی بازرگانی، وەك دیاردەیەکی ئابووری نێوان ئاواییەکان لە ناوچەکەدا هەبووە، وەك: نەینەوا، تەپە گەورە، (نوزی))، مەتارەو شاغربازار[٢٢٠]. کە پێویستی بە سیستەمێکی بەڕێوەبردن هەبووە بۆ ڕێکخستنی ئەو دیاردە ئابووری و کۆمەڵایەتییانە،

بەڵام چۆنییەتی ئەو بەڕێوەبردنە تا ئێستا نەزانراوە، چونکە لەو سەردەمانەدا هیچ تۆمارێك نەبووە[٢٢١].

**٢. چاخی بنەماڵەکان[٢٢٢]:**

زانیارییەکی وورد لە بەر دەستدا دەربارەی ناوچەکانی (سوبارتو) لەم سەردەمەدا نییەو ئەوەی تا ئێستا زانراوە هەندێ زانیاری کەمن، هەندێك لە پاشایانی سۆمەری کۆن تۆماریان کردوون.

یەکێك لەو تۆمارانە بۆ نیوەی یەکەمی هەزارەی سێیەم دەگەڕێتەوە، کە لەلایەن فەرمانڕەوای شاری (ئادەب) بەناوی (لوگاڵ - ئانی - موندو)، وەك ناوچەیەکی جوگرافی ناوی بردووە[٢٢٣]، چونکە پاشگری (ki) بۆ شار یان شوێن لە وڵاتی سۆمەردا بەکارهاتووە. بەوپێیە ناوچەی (گوتیوم) دەکەوتە باکووری خۆرئاوای باراخشی، ئەویش سنووری لەلای باکووری خۆرئاواوە لە رووباری دیالەدا کۆتایی دێت[٢٢٤]، لە ناوچەکانی نێوان زێی بچووك و رووباری دیالە، بە گاسووریشەوە دەگرتەوە.

لە لیستێکی پاشایانی سۆمەردا، کە بۆ ناوەراستی هەزارەی سێیەم دەگەڕێتەوە، ناوی (خەتانش) پاشای خەمازی تۆمارکراوە، کە پاشایەکی دوژمنی دەوڵەتە شاری کیش بووە، ئەو پاشایە ماوەیەکی زۆر فەرمانڕەوایەتی شاری کیشی کردووەو دواتر لەلایەن پوزوزو وەدەر نراوە[٢٢٥]، لە لایەکی ترەوە، لە ئەرشیفی ئێبلادا، نامەیەك دۆزراوەتەوە، کە لەلایەن (ئەرکب - دامو) پاشای (ئێبلا) بۆ(زیزی)[٢٢٦] پاشای (خەمازی) نێررا بوو، لە نامەکەدا داوای سەرباز کراوە، (فەوزی رەشید[٢٢٧]) پێی وایە بەهۆی ترسی هەردوولا لە دەوڵەتی کیش، کە لەوسەردەمەدا دەیویست هێرش بکاتە سەریان، ئەو پەیوەندییەی هێناوەتە ئاراوە، بە هەر حاڵ، ئەوە نیشانەی هێزو توانای دەوڵەتی خەمازییە، کە دەسەڵاتی هەموو ناوچەکانی خۆرهەڵاتی دیجلەی گرتبوو، تا ئێستا نزیکترین ناو لە خەمازییەوە، گوندی (خەمزە)یە لە باکووری ئەزمردا، بۆیە پێدەچێت ناوەندی شانشینی خەمازی لەو ناوچەیەدا بووبێت[٢٢٨]، تا دەوڵەتش ئەم بۆچوونە لە هەموو بۆچوونەکانی تر نزیکترە لە راستییەوە، چونکە ناوەکە زۆر لە ناوی (خەمازی)یەوە نزیکەو بۆچوونەکانی تر بەڵگەی هاوشێوەیان نییە.

لە لایەکی ترەوە، (شتاینکلەر) پێی وایە خەمازی پایتەختی دەوڵەتی سوبارتو بووەو دەکەوێتە نێوان زێی گەورەو بچووك، بەڵگەشی بۆ ئەوە، نەخشێکی (ئی - ئەنناتم - Eannatum) (٢٤٥٤ - ٢٤٢٥) پێش زاییندا، کە باسی لە جەنگێك لە دژی هاوپەیمانێتی نێوان ئیلام، ئورواو سوبارتو کردووە، بەو پێیەی زۆرجار ناوی خەمازیو سوبارتو بەیەکەوە هاتووەو لەو سەردەمەشدا خەمازی هێزێکی سیاسیو سەربازی بووە. لە نەخشەکەدا دەردەکەوێت، کە شەڕەکان لە سوبارتودا لە باکووری رووباری دیالەدا روویانداوە، چونکە دەوڵەتی (لەگەش) تەنها دەوڵەتە شارێك بووەو فەرمانڕەواکە پلەی (ئینسی)[٢٢٩] هەبووە، و باس لەناوچەی ئاسوهور (Asuhur) لە باکووری رووبارەکە دەکات[٢٣٠]. بەو شێوەیە لە هەموو سەرچاوەکانەوە روونەدەبێتەوە، کە شانشینی خەمازی لە ناوەراستی هەزارەی سێیەمدا فەرمانڕەوایەتی ناوچەکانی خۆرهەڵاتی دیجلەی کردووە، بە ناوچەی گاسووریشەوە.

**٣. چاخی ئەکەدی (گاسوور) (٢٣٣٤ - ٢١٩٨؟)ی پێش زایین:**

لەگەڵ پەرەسەندنی بارودۆخی سیاسی لە وڵاتی سۆمەردا، زانیاری دەربارەی ئەوسەردەمە زیاتر دەبوو تا لە ناوبردنی قەوارە سیاسییەکانی دەوڵەتە شارەکانی سۆمەر لەلایەن (سارگۆنی ئەکەدی) لە نزیکەی (٢٣٣٤ - ٢٢٧٩) ی پێش زایینو توانی دەوڵەتێکی سەرتاسەری ناوەندی دابمەزرێنێتو شاری (ئەکەد) بکاتە پایتەخت[٢٣١]. دوای ئەوەش بەشێوەیەکی فراوانو یەك لەدوای یەك بەرەو ناوچەکانی دەورووبەر پەلی هاویشت، توانی ناوچەکانی باکوور داگیر بکات[٢٣٢]، لەوانەش وڵاتی سوبارتوو بوو، دوای ئەوەش نازناوی پاشای (عالیاتم)ی[٢٣٣] لە پاڵ پاشای ئەکەددا تۆمارکرد، بەوەش ناوچەی (گوتیوم کی)ی دەگرتەوە.

سارگۆن لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی خۆیدا، کە نزیکەی (٤٠) ساڵی خایاندووە، چەندین لەشکرکێشی کردووەتە سەر ناوچەکانی سوبارتوو، لەنێوان چیاکانی زاگرۆس لە خۆرهەڵاتو خاپورو بالیخ تا دەریای ناوەڕاست لە باکووری خۆرئاوا. لە یەکێك لە تۆمارەکانیدا ناوی شیموروومو چەند ناوچەیەکی تۆمارکردوە، کە یەکێك بووە لە گرنکترین ناوچە هەڵگەراوەکان لە دژی سارگۆن[٢٣٤]. بەو پێیە ئەم ناوچەیەشی داگیر کردووەو کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی ئەکەدی[٢٣٥].

سەرەرای درێژی ماوەی دەسەڵاتی سارگۆن، تا ئێستا تۆمارێکی روونی لە بارەی ئەو ناوچانەوە نەدۆزراوەتەوە، کە چۆن فەرمانڕەوایەتی کردووەو پێ ناچێت دەسەڵاتێکی هەمیشەیی لەو ناوچانەدا دامەزراندبێت[٢٣٦]. چونکە ئامانجی سارگۆن لەو ناوچانەدا زیاتر بۆ پاراستنی سەرچاوە کانزاییەکانو رێگا بازرگانییەکان بووەو تەنها قەڵاو خاڵی سەربازی جێهێشتووەو هەر کاتێك هەستی بە مەترسی لەسەر ئەو بەرژەوەندیە کردبێت، لەشکرکێشی ئامادە کردووە[٢٣٧].

لە دوای سارگۆن، (ریموش) (٢٢٧٨ - ٢٢٧٠ )ی پێش زایینو (مانیشتوسو) (٢٢٦٩ - ٢٢٥٥ )ی پێش زایین، هاتنە سەر تەختی پاشایەتی، سەرەرای کەمی زانیاری، زانراوە جێنشینانی سارگۆن هەوڵیان داوە بەهێز دەسەڵاتی خۆیان بسەپێننو لەو ناوچانەدا پاشماوەیان جێهێشتووە، وەك بنیاتنانی شارێك لە باکووری نەینەوا بەناوی ریموشو لە نەخشێکدا کە لە (تەل براك)دا دۆزراوەتەوە ناوی تێدا تۆمارکراوەو[٢٣٨] (مانیشتوسو) پەرستگایەکی لە نەینەوا بنیاتناوە[٢٣٩].

لە کۆتایی دەسەڵاتی ریموشدا، کە خۆیی بوو بەقوربانی کێشەیەکی ناو خۆیی، گەلانی ناوچەکانی سوبارتوو راپەڕین، بۆیە هەر لە سەرەتایی هاتنە سەر تەختی (نرام - سن) (٢٢٥٤ - ٢٢١٨ )ی پێش زایین دەستی کرد بە لەشکرکێشییەکی فراوان، نازناوی (پاشای علیاتم)

ی لە خۆناو[٢٤٠] هێمایی خواوەندی لە پاڵ ناوی خۆیدا نەخشاند[٢٤١]، ئەم پاشایە زۆرترین لەشکرکێشی ئەنجام داوەو ماوەی دەسەڵاتی گەشەی زیاتری بەخۆوە بینیوە، چونکە دوای لەشکرکێشییەکانی بۆ سەر ناوچەکانی خۆرهەڵات و باکووری خۆرئاوای دیجلە، زۆربەی شارەکان لەم چاخەدا پەرەیان سەندو ئاوەدان کراونەتەوە، وەك، گاسوور (نوزی)، نەینەوا، شاغربازارو براك[٢٤٢].

بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەو ناوچانەدا، (نرام – سن) هەوڵی داوە کە دانیشتووانی ناوچەکە وەك کۆیلە بەرەو وڵاتی ئەکەد بەرێت و لە بەرامبەردا رەگەزی ئەکەدی دەهێنا بۆ ئەو شارانە[٢٤٣]، ئەوەش بۆ پڕکردنەوەی پێداویستی بۆ بەڕێوەبردن، ئابووری، وسەربازی تا دەسەڵاتی هەمیشەیی بەسەریاندا بسەپێنێت.

شاری گاسوور (نوزی) لەم سەردەمەدا گەشەی سەندووەو بووە بە ناوەندێکی گرنگی هەرێمەکە وناوی لە دەقەکانی ئەو سەردەمەدا هاتووەو پێدەچێت پاشماوەکانی گاسوور بۆ سەردەمی (نرام – سن) بگەڕێتەوە، زۆرترین پاشماوەی ئەکەدی لەم ناوچانەدا لە گاسووردا دۆزراونەتەوە[٢٤٤]. ئەوەش بۆ پێگەی جوگرافی و ئابووری دەگەڕێتەوە، کە دەروازەیەك بوون بۆ وڵاتی لوللوو شیمورم لە خۆرهەڵات و باکوورییەوە.

زانراوە کە دەوڵەتی ئەکەدی لە ماوەی دەسەڵاتی (نرام – سن)دا گەیشتبووە لوتکە، نەك تەنها لەرووی فراوانییەوە، کە لە خۆرهەڵاتەوە گەیشتە (ئیلام) و[٢٤٥] (دیار بەکر)[٢٤٦] لە باکوورو دەریای ناوەڕاست (سەروو) لە باکووری خۆرئاوا، تا لە باشوورەوە دەگەیشتە کەنداو (دەریای خواروو)، بەڵکو شارەکانی وەك شاغربازار، براك، نەینەواو ئاشوور، گەشەیان سەندبوو، لەلایەن ئەکەدییەوە بەڕێوەبراون[٢٤٧]. بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە پاشماوەی مادی و تۆمارکراو لە هەموو ئەو ناوچانەدا دۆزراونەتەوە، بەشێوەیەکی راستەوخۆ لە چۆنییەتی بەڕێوەبردنی ئەو شارانە نادوێن. لەگەڵ ئەوەشدا زانراوە کە دەوڵەتی ئەکەدی سیستەمێکی کارگێڕی ناوەندی بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت و هەرێمەکانی ئیمپراتۆریەت پەیرەوکردووە، چونکە بەڕێوەبەرو فەرمانڕەواکان لەو شارانەدا، لەلایەن پاشاوە دیاری دەکران[٢٤٨].

سەبارەت بە چۆنییەتی بەڕێوەبردنی (گاسوور) و پایەی کارگێڕی ئەم شارە لەو سەردەمەدا، وەك لە دەقەکاندا روون دەبێتەوە باڵاترین پلەی کارگێڕی (ئینسی – Ensi) بووە، کە راستەوخۆ لە بەرامبەر پاشادا لێپرسراو بووە، چونکە خۆی ئەم پلەیەی بە ئەکەدی رەگەزەکان بەخشیوە، یاریدەدەر بە پلەی دووەم لە دوای (ئینسی)دا دێت و بە (ماشکیم – maškim) ناسرا بوو، کاروباری ناوخۆیش لەلایەن ئەنجومەنێکی پیرانەوە بەڕێوە دەبرا، جگە لەوانەش وەزیفەی دادوەر لە بەڕێوەبردن دا هەبووە. هەروەها چەند وەزیفەیەکی لاوەکی تریش هەبووە، وەك، دەرگاوانی شار، خزمەتکاران، ئاوگێر[٢٤٩].

سەبارەت بە پایەو دەسەڵاتی و ئەرکەکانی (ئینسی) لە گاسوور، وەك زانراوە کەوا سەرەڕای دەسەڵاتی کارگێڕی و دادوەری، لەبەر ئەوەی کە (ئینسی) لە ژێر رکێفی پاشادا بووە، بەگشتی سنووردار بووە، لە لایەکی تریشەوە بە هۆی نەبوونی هیچ ئاماژەیەك بۆ ئەفسەری سەربازی دەبێ ئەم دەسەڵاتە، واتە دەسەڵاتی کاروباری سەربازی لە ڕێی (ئینسی)یەوە لە ژێر سایەی پاشادا بووبێت[٢٥٠].

لە لایەکی تریشەوە کاروباری ئابووریش کارمەندی تایبەتمەندی هەبووە، ئەوەش بەبوونی وەزیفەی چاودێری رووپێو یاخود تۆمارکاری کێڵگەکان (Sag - Sug)، وەك ئەمینداری تۆماری پەیوەندیدار بە خاوەندارێتی کاری کردووە، سەربازی و هەندێ چالاکی ئابووری تر، وەك بازرگانی لەگەڵ شارەکانی تردا[٢٥١].

گەلانی ژێر دەستە لە ئیمپراتۆرییەتی ئەکەدیدا، لە هەلێك دەگەڕان کە بتوانن سەربەخۆیی بەدەست بهێنن، ئەو هەلەشیان لە کۆتاییەکانی دەسەڵاتی (نرام – سن)دا بۆ رەخسا، هەرێمەکانی ئیلام، گەلانی زاگرۆس (لولوبی، گوتی، خوری، ...تاد) جیابوونەوە. بەڵام گەورەترین مەترسی راستەوخۆ لەلایەن (گوتی)ەوە بوو، کاتێك هەموو ئەو گەلانە (گوتی، لولوبی، خوری) هێرشیان کردە سەر دەوڵەتی ئەکەدی[٢٥٢] و پاشایەکی گوتی هاوچاخی (نرام – سن) بەناوی (ئێریدوپزێر) بەشی باکووری دەوڵەتی ئەکەدی تا نیپوری[٢٥٣] خستە ژێردەسەڵاتی خۆیەوە[٢٥٤]. و بەوپێیەش ناوچەکانی گاسوورو (ئەراپخا)ش وەك هەرێمەکانی تری سوبارتوو، لە کۆتاییەکانی سەردەمی (نرام – سن)دا سەربەخۆ بوون، سەرەڕای ئەوەی (شار – کالی – شاری) (٢٢١٨ – ٢١٩٨؟)ی پێش زایین کوڕی (نرام – سن) هێرشی کردووەتە سەر ئەو ناوچانەو بووە هۆی بوژانەوەی ئەکەدی، بەڵام سەنگی هێز بەلای پاشای گوتی (ئیلولومێش)دا شکایەوەو بۆ دواجار دەوڵەتی ئەکەد لە ناوچوو، و توانیان نزیکەی سەد ساڵ فەرمانڕەوایەتی ئەکەد بکەن[٢٥٥].

### ٤. چاخی گوتی (٢٢٢٠ - ٢١٢٠؟) پێش زایین:

دەوڵەت بەپێی ئەو توێژینەوانەی کە ئەنجام دراون، نەتوانراوە سەردەمی گوتی و چۆنییەتی فەرمانڕەوایەتی کردنیان بەتەواوەتی روون بکرێتەوە[٢٥٦]، ئەوەی کە زانراوە ناوی پاشاکانیانە کە لە لیستی پاشایەتی سۆمەریدا تۆمارکراون و لە تۆماری سەربازی سۆمەری و ئەکەدیدا ناوی (گوتیوم – کی – Gutiumki) هاتووە، بوونی پاشگری /Ki/ نیشانەی هەرێمێکی جوگرافی دەگەیەنێت[٢٥٧].

بۆ یەکەم جار لە کۆتاییەکانی سەردەمی (نرام – سین)دا رۆڵی سیاسی گوتی دەرکەوت، کاتێك کە پاشایەکی (ئێریدوپی –وەزیر)[٢٥٨] (Erridu - Pi - Wazir) سەرکردایەتی هێرشێکی گەلانی سوبارتووی کردو توانی شاری نیپور داگیربکات[٢٥٩].

زۆربەی ئاماژەکان بۆ ئەوە دەچن کە گوتی تەنها بەشی باکووری ئەکەدی داگیر کردبێت، باشوور (وڵاتی سۆمەر)ی نەگرتبێتەوە[٢٦٠]. چونکە پاشاکانی تریش وەك (سارلگاب)،

کە هاوچاخی (شار - کالی - شاری) (Šarkališarri) ئەکەدی بووە، ململانێی سەربازی بەردەوام بووەو[٢٦١] (شار -کالی - شاری) ئەم پاشایەی بەدیل گرتووە[٢٦٢]. هەروەها باکووری میسۆپۆتامیا (وڵاتی ئاشوور) لە هەموو شوێن زیاتر کاولکاری بەرکەوتووە[٢٦٣]. ڕێی تێیدەچێت کە هێرش بۆ سەر ئاشوور لەلایەن گەلانی هاوپەیمانی گوتی بوو بێت، بە تایبەت دەولەتی (ئورکیش)ی خوری، کە لەو سەردەمەدا لە سەروی دیجلەدا زۆر بەهێز بوو[٢٦٤].

پاشایەکی تری گوتی: (ئیلو - لومیش - Elulumeš) بوو، کە توانی دەولەتی ئەکەدی هەراسان بکات[٢٦٥]، گوتییەکان لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی خۆیاندا کە زیاتر بەشی باکوورو ناوەڕاستی میسۆپۆتامیایانی گرتبۆوە، ماوەی (٩٠ - ١٢٥) ساڵ فەرمانڕەوا بوون‌و نزیکەی (٢١) پاشایان لە لیستی پاشایانی سۆمەریدا تۆمارکراوە[٢٦٦]. پاشایەکی سۆمەری لە وەرکا بەناوی (ئوتوخیگال)[٢٦٧] توانی پاشای گوتی (تیریگان) بەدیل بگرێت، بەو شێوەیە دەسەڵاتی گوتی لە وڵاتی ئەکەد کۆتایی هات. بە پێی نوسراوەکەی ئوتوحیگال، گوتییەکان بۆ (ئەراپخا) کشانەوە[٢٦٨]. ئەمەش وامان لێدەکات کە (ئەراپخا) بە پایتەختی گوتی بزانین.

تا ئێستا زانیاری وورد لە چۆنیەتی دەسەڵاتی گوتی‌و ماوەی فرمانڕەوایەتییان ڕوون نەبۆتەوە، چونکە زۆربەی سەرچاوەکان بەشێوەیەکی نارێك‌و جیاواز باسیان دەکەن. بە پێی تۆمارە سۆمەرییەکان، کورتی ماوەی فەرمانڕەوایەتی پاشایانی گوتی بەلاوازی‌و بێ سەروبەری لە قەڵەم دەدەن‌و هەمان ڕا دووبارە دەکەنەوە، کە سەردەمی گوتی تەنها پشێوی‌و کاولکاری بووە[٢٦٩]، بەڵام بەڕای (دیاکۆنۆف)[٢٧٠]، لە ڕوانگەی کۆمەڵی گوتییەوە بڕوانینە دۆخەکە، بە شێوەیەکی ترە، چونکە کۆمەڵگای گوتی لە چاو کۆمەڵی سۆمەری - ئەکەدییەوە خێڵەکی بوون‌و شێوازی فەرمانڕەوایەتی خێڵەکی بە شێوازی هەڵبژاردن پاشاکان دیاری دەکران، بۆیە زۆربەیان ماوەی ساڵانی دەسەڵاتیان وەك یەك بووەو زۆر جار هەمان پاشا جارێکی تر دووبارە هەڵبژێردراوەتەوە. لە بەرامبەردا سیستەمی دەسەڵاتی سۆمەری - ئەکەدی پاشایەتی تا مردن‌و لە باوك بۆ کوڕ بووە. جگە لە وەش (لائیراب)و (ئیریدوپیزیر) پاشایانی گوتی نازناوی (پاشای هەر چوار لای جیهان) ناوزەند کردووە[٢٧١]و ئەمەی دوایی لە تۆمارێکی درێژدا نازناوی پاشای گوتیوم‌و هەر چوار لای جیهانی لە خۆی ناوە، ئەوەش نیشانەی هێزو دەسەڵاتە، لە بەشێکی تری نەخشەکەیدا باسی لە بەزاندنی (کانیشبا)ی پاشای شیمورم کردووە، کاتێك، کە (کانیشبا) بە هاوکاری لوللو لە دژی ئەم پاشایە هەڵگەڕابۆوە[٢٧٢]. لە لایەکی ترەوە، لائیراب زۆر بایەخی بە ئەدەب‌و ڕۆشنبیری ئەکەدی داوە، ئەوەش بەڵگەیە بۆ یەکێتی‌و ڕێکخستنی سیاسییان[٢٧٣].

**٥. چاخی بنەماڵەی سێیەمی ئور: (٢١١٢ - ٢٠٠٤ )ی پێش زایین:**

پاش کۆتاییهاتنی دەسەڵاتی گوتی لە وڵاتی ئەکەد، دەولەتە سۆمەرییەکان کەوتنە ژێر دەسەڵاتی ناوەندی لە وەرکا (٢١٢٠ - ٢١١٦)ی پێش زایین، لە دوای ئەو ماوەیەدا فەرمانڕەوایەکی (شاری ئور) بە ناوی (ئۆرنەمو) سەربەخۆیی ڕاگەیاند، دواتر شارەکانی تری خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، بەوەش ناوەندی دەسەڵات کەوتە دەست شاری ئورو دەولەتێکی بەهێزی بنیاتنا کەنزیکەی سەدەیەك درێژەی کێشا[٢٧٤].

دوای ئورنەمو، کوڕێکی بەناوی شولگی (٢٠٩٥ - ٢٠٤٨ )ی پێش زایین چووە سەرتەخت، ئەم پاشایە لە سەرەتاوە خەریکی ئاوەدانکردنەوەو بنیاتنانی پەرستگا بووە، بەڵام دواتر ڕوویکردە ئامانجە سەربازییەکان‌و زیاتر بایەخی بە لەشکرکێشی بۆ سەر وڵاتانی دەرەوە دەدا، وەك، ئیلام لە خۆرهەڵات‌و ئاشوور لە باکووردا[٢٧٥]. سەبارەت بە ناوچەکانی سوبارتو بە گشتی‌و (ئەراپخا) بە تایبەتی. زانراوە کە (شولگی) لە ماوەی دەسەڵاتیدا چەندین لەشکرکێشی کردووەتە سەر گەلانی ناوچەکە[٢٧٦].

لەشکر کێشی یەکەم‌و دووەم بۆ ناوچەکانی (کەرخەر) و[٢٧٧] (شیمورم) لە باکووری خۆرهەڵاتی بەرزاییەکانی حەمرین بوو، سێیەمیش بریتی بووە لە لەشکر کێشییەکی گشتی بۆ سەر ناوچەکانی خۆرهەڵاتی دیجلە، تا شاشروم (شمشارە)و (ئۆربیلوم - هەولێر)و وڵاتی لوللوی (شارەزوور) گرتەوە[٢٧٨].

لە دوای شولگی، کوڕێکی بەناوی (ئەمار - سین) (٢٠٤٧ - ٢٠٣٩)ی پێش زایین دەسەڵاتی گرتە دەست، ئەم پاشایە لە دوای چەندین لەشکرکێشیدا بۆ سەر ناوچەکانی ئۆربیلوم‌و شاشروم لە خۆرهەڵاتی دیجلەدا، تا ڕادەیەك توانیویەتی دەسەڵات بەسەر ئەو ناوچانەدا بسەپێنێت[٢٧٩]، ئەم ناوچانە لەو سەردەمەدا وەك سنووری پێشەوەی دەولەتی (ئوربوون)[٢٨٠]. بەو پێیەی، کە (ئەراپخا) دەکەوێتە باشووری ئەم ناوچانە، دەبێ لەوکاتەدا لە ژێر دەسەڵاتی ئوردا بووبێت.

ئامانجی داگیرکردنی ئەو ناوچانە لەلایەن پاشایانی بنەماڵەی سێیەمی ئور، ئەوە بوو وەك سەرچاوەی کانزاو بەردی بەنرخ سوودیان لێ دەبینی، بەڵام لایەنێکی گرنگی تری هەبوو، ئەویش دەست بەسەرداگرتنی سامانی ئاژەڵی[٢٨١] بوو، کە ناوچەکە پێی دەولەمەند بوو، هەروەها ئەو ناوچانە سەرچاوەیەکی سەرەکی بەدەستکەوتنی کۆیلە بوون، بەتایبەت لە سەردەمی شولگی‌و (ئەمار - سین)دا بەشێوەیەکی فراوان خێزانە خوری‌و ئەوانی تری ناوچەکەیان بەرەو قوڵایی وڵاتی سۆمەر دەبرد، لەوێدا وەك هێزی کار، یان وەك پیشەگەر سوودیان لێ دەبینرا، بەڵام هەندێکیان لە کۆمەڵگای سۆمەریدا لە پلەی کۆیلایەتی بەرزیان هەبووە، وەك نووسەر[٢٨٢].

پاشایانی ئەم بنەماڵەیە بەهۆی ڕژێمێکی کارگێڕی بەهێزەوە توانیبویان ڕوودانی هەڵگەڕانەوەی ناوخۆیی

هەرێمەکان کەم بکەنەوە، بەتایبەت بەهۆی سەپاندنی دەسەڵاتی وورد بەسەر فەرمانڕەوا ناوخۆییەکان دا[٢٨٣]، بەوەی کە دەسەڵاتی سەربازی لە دەست دەسەڵاتی ناوەندیدا بوو، واتە پاشای ئور، و فەرمانڕەوا ناوخۆییەکانیان لە شوێنی خۆیان دەگواستەوەو لە شارێکی تردا دایاندەنان، هەروەها دامەزراندنی سیستەمێکی تووندی پۆستە، کە بە بەردەوامی هەواڵی بارودۆخی هەرێمەکانی دەگەیاندە دەرباری پاشا[٢٨٤]. بەو پێیەش پاشا ئاگاداری هەموو جموجۆڵێکی ئەو ناوچانە دەبۆوە کە لە دژی دەوڵەت سەریان هەڵدەداو زوو خامۆشی دەکردنەوە[٢٨٥]. جگە لەوەش زۆرجار پاشاکان هەوڵیان داوە ژن وژن خوازی لەگەڵ هەرێمەکاندا، بەتایبەت لەگەڵ چیا نشینەکاندا ئەنجام بدەن.

فەرمانڕەوایەتی هەرێمەکان، لە رووی دەسەڵاتەوە جیاواز بوون، هەرێمی ئاشوورو ئیلام دەسەڵاتێکی نیمچە سەربەخۆ بوون، بەڵام هەرێمەکانی تر دەسەڵاتی ناوەندییان لەسەر بەهێزدەکرا[٢٨٦]. وەك زانراوە کە فەرمانڕەوایی ناوچەی (سوبیر)و (کارداکا) (لە باشووری خۆرئاوای دەریاچەی وان) بە (سوکال – ماخ)[٢٨٧] ناسراوە، کە دەسەڵاتی لە ئۆربیلوم و کەرخەرو وڵاتی گوتییەکان و خەمازی دەگرتەوە[٢٨٨].

دوای (ئەمار – سین) چەند پاشایەك هاتنە سەرتەخت، کە سەرەڕای هەوڵی زۆر، نەیانتوانی هێزوشکۆی دەوڵەت بپارێزن، دەوڵەت تووشی مەترسی دەرەکی دەبۆوە، وەك: ئیلامییەکان لە خۆرهەڵات و ئامورییەکان لە خۆرئاواوە، گوتی و خوری لە باکوورو باکووری خۆرهەڵاتەوە. بەڵام هەرەشەکان زیاتر لە سەردەمی (ئەبی – سی)ندا دەرکەوتن و ناوچەکانی سوبارتوو (ئەراپخا) لە ژێر دەستی ئوردا نەما بوون و ڕۆڵی بەرچاویان لە رووخانی ئوردا هەبووە[٢٨٩]، چونکە ئەم پاشایە دیوارێکی دوورودرێژی لە باکووری بەغدای دەوڵەت، بەرەو خۆرهەڵات تا نزیك دیالە[٢٩٠]، کە بۆ رووبەرووبوونەوەی هێرشی گەلانی ناوچەکە بنیاتنا، بە تایبەت لەو سەردەمەدا خوری وەك هێزێکی سیاسی ئەتنیکی سەری هەڵدا بوو، بەرەو باشوور پەرەی دەسەند[٢٩١]، لە لایەکی تریشەوە گەلانی ناوچەکانی کە بە سوبارتو ناسرابوون، ڕۆڵی سەرەکییان لە رووخاندنی ئوردا هەبوو، کە ڕێی تێدەچێت خورییەکان بووبێتن.

*** تەوەری دووەم:**

**بارودۆخی سیاسی (١٩٩٩ - ١٣٣٠)ی پێش زایین:**

*** باسی یەکەم: سەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زایین تا ١٧٥٠؟ پێش زایین:**

دوای لاوازبوونی دەوڵەتی بنەماڵەی سێیەمی ئور، خورییەکان لە ناوچەکانی باکووری خۆرهەڵاتی دیجلەدا دەسەڵاتیان لە زیادبووندا بوو. هەموو ئەوناوچانە سەربەخۆ بوو بوون و چەندین هێزی سیاسییان پێکەوەنا. بەهۆی نەبوونی پشکنین لەو ناوچانەدا، زیاتر پشت بە ئەرشیفەکانی شمشارەو دوای وەستانی ئەو تۆمارانە، پشت بە ئەرشیفەکانی ماری دەبەسترێت، هەردوو ئەرشیفەکە ژمارەیەکی زۆر لە نامەی ئاڵوگۆڕکراو دەگرنە خۆ، کە لەلایەن پاشاو فەرمانڕەوایانی ناوخۆو ناوچەکەوە گۆڕاوەتەوە.

باڵا دەستی خوری لەو ناوچانەدا بەپێی دوو نەخش، کە لە ئیشنونای[٢٩٢] نزیك دیالە دۆزراونەتەوە سەلمێنراوە، لە سەرییەکێکیاندا ناوی پاشایەك تۆمارکراوە، کە نازناوی (پیاوی نینوا[٢٩٣])ی لە خۆی ناوە، ئەم شارە لەو سەردەمەدا بە ناوەندی پەرستنی خواوەند (شاوشکا) ی خوری ناسرابوو[٢٩٤]. لە ناو بەڵگەنامەکانی ئیشنونادا، مۆرێکی شاهانە دۆزراوەتەوە، کە بەم شێوەیە تۆمارکراوە: (تیش – ئەتەل پاشای کەرخەر)، هێمایەك پێش ناوی پاشا تۆمارکراوە، کە نیشانەی خواوەندێتییە. ئەوەش نیشانەی هێزو دەسەڵاتەو لە ناوچەکەدا نموونەی تری هەبووە[٢٩٥]. سەبارەت بە شوێنی کەرخەر، زۆربەی سەرچاوەکان پێیان وایە، کە دەکەوێتە ناوچەکانی نێوان رووباری (دیالە – سیروان)و کەرکوك[٢٩٦]. بەو پێیەی، لە لایەکی ترەوە لە هەمان چاخداو بەهەمان ناو (تیش – ئەتەل) وەك پاشای ئورکیش[٢٩٧] ناسراوە[٢٩٨]، دەیسەلمێنێت، کە ناوچەکانی باکووری (دیالە – سیروان)و خۆرهەڵاتی دیجلە لە کۆتایی چاخی بنەماڵەی سێیەمی ئورەوە لەلایەن پاشایانی خورییەوە فەرمانڕەوایەتی کراوەو لەو سەردەمەوە هیچ هێزو دەسەڵاتێکی ناوەندی سۆمەری یان بابلی لەو ناوچانەدا نەبووە[٢٩٩]. جێی سەرنجە، لەو ماوەیە بەدواوە چارەنوسی دەوڵەتی کەرخەر نەزانراوەو لەوانەیە پشکنینی زیاتر لەو ناوچانەدا زانیاری لەمبارەیەوە بدات بە دەستەوە. ئەرشیفەکانی شمشارە بۆ دوو قۆناغی سەرەکی دابەش دەکرێن: قۆناغی ئاڵوگۆڕی نامەکانی نێوان فەرمانڕەوایانی زاگرۆس و کوواری شارەکە، قۆناغی دووەم، لە سەردەمی دەسەڵاتی ئاشووریدا، کە هاوکاتی بیست و هەشتەمین ساڵی فەرمانڕەوایەتی (شمشی – ئەدەدی یەکەم) (١٨١٣ – ١٧٨١)ی پێش زایین تا کۆتایی دەسەڵاتی ئاشووری لەلایەن توروکوو هاوپەیمانەکانییەوە لە ناوچەکەدا دەگرێتەوە، لەو ماوەیەدا کوواری سەر بە دەوڵەتی ئاشووری بوو[٣٠٠].

*** دەوڵەت و میرنشینەکان:**

بەگشتی هێزەکانی ناوچەکە لە شێوەی دەوڵەت یان میرنشینی بچووك بچووکدا بوون، پاشاکانیان لە ناوەندی شارێکدا فەرمانڕەوایەتییان دەکرد. هۆزەکانی (تورووکو) ی[٣٠١] خوری لە هەموو هێزەکانی تر زیاتر ناوبراون، کە لە یەکێتیی هۆزە خورییەکان پێکهاتبوون[٣٠٢]. لەو سەردەمەدا، پاشایەکیان بەناوی (تالپو – شاری – Talpu - Šarri) لە شاری (کونوشوم – Kunušum)ەوە لە ناوچەی (ئوتوم – Utūm) فەرمانڕەوایی شانشینەکەی دەکرد، کە لە خۆرهەڵاتەوە لە شاخەکانی دەورووبەری قەڵادزێی دەوڵەتەوە تا قابرا[٣٠٣] بووە. کوواری فەرمانڕەوای شمشارە پێش ئەوەی بچێتە پاڵ ئاشوور، سەر بە پاشای تورووکو بوو[٣٠٤].

لوللوییەکان، وەك لە دەقەکانی شمشارەدا دەردەکەوێ، بەتایبەت لە نامەیەکی شیپراتوو ناوێکدا بە کۆ ناوی پاشاکانیانی هێناوە، بەوپێیەش دەوڵەتێکی یەکگرتوویان نەبووە، لەو نامەیەدا داوای لە کوواری کردووە، کە پشتگیری لوللوییەکان بۆ خۆی مسۆگەر بکات[٣٠٥]. سەرەڕای ئەوەش توانیبوویان هێزێکی وەك ئیشنۆنا ببەزێنن، کاتێك ئەمەی دوایی هاوپەیمانی ئاشوور بوو[٣٠٦]. گوتییەکانیش لە ناوچەکانی خوارووی لوللوییەکانەوە هێزێکی تری ناوچەکە بوون لەو سەردەمەداو لەنێوان هاوپەیمانییەتەکانی ئەوسەردەمەدا ڕۆڵێکی کاریگەرییان هەبووە[٣٠٧].

چەند هێزێکی تریش سەرای ئەوەی لە سەرچاوەکانی ئەو سەردەمەدا کەمتر ناوبراون، ڕۆڵی کاریگەرییان بینیوە، یەکێك لەوانە، شیمورم بووە، کە لە ناوچەکانی نێوان ڕووباری دیالە – سیروان تا زێی بچووکدا بووە[٣٠٨]، لەوسەردەمانەدا ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە، بەتایبەتی لەڕووی دیبلۆماسییەوە، چونکە نوێنەریان بۆ ماری ناردبوو، پێدەچێت بۆ ماوەیەك هاوپەیمانییەتی لەگەڵ ئەخازومدا پێکهێنابێت[٣٠٩]. قابرا، هێزێکی تری ئەو سەردەمە بووە، کە دەکەوتە نێوان (ئەراپخا) و ئۆربیلوم لە لێواری باکووری زێی بچووکدا[٣١٠]. هەروەها کاکمییەکان، لە ناوچەکانی کۆیەی دەوڵەتدا[٣١١]، (ئەراپخا) ش پێدەچێت لەو سەردەمەدا تا داگیرکردنی لەلایەن ئیشنۆنا و ئاشوورەوە، دەوڵەتێکی سەربەخۆ بووبێت[٣١٢].

هەروەها چەند هێزێکی تر، کە لەو سەردەمەدا ڕۆڵی گرنگیان دەبینی و بەگشتی پەیوەست بوون بە ناوچەکانی خۆرهەڵاتی دیجلەوە، ئەوانیش دەوڵەتی ئاشووری لەسەردەمی (شمشی – ئەدەد)ی یەکەم، کە سێ ناوەندی هەبوو: ئاشوور لە لێواری خۆرئاوای دیجلە و ئیکاللاتوم لە لای باکوورییەوە، شوبات ئینلیل لە ناوچەکانی خاپور، هەروەها دەوڵەتی ئیشنۆنا لە ناوچەی دیالەی دەوڵەتدا[٣١٣].

*** ململانێی سیاسی:**

شانشینی تورووکو، وەك لەسەرەوەدا ئاماژەی بۆکراوە، هێزێکی سەرەکی ناوچەکە بووە، کە دەسەڵاتی لە خۆرهەڵاتی شاخەکانی ڕانیەوە تا قابرای سەر زێ درێژببۆوە. لە ماوەی پێش دەسەڵاتی ئاشووری لە ناوچەکەدا[٣١٤]، ململانێیەکی توندی لەگەڵ گوتییەکاندا هەبوو، پاشایەکی گوتی بەناوی (ئیندۆش – Indošše) گەمارۆی تورووکوی دابوو، بۆیە پاشایەکیان بەناوی (تالپوشاری – Talpu - šarri)، هاوپەیمانێتییەکی لە هۆزو شارەکانی ناوچەکە پێکهێنا، دەوڵەتی ئیلامیش لەو هاوپەیمانێتییەدا بوو، چونکە ئەمان دژی گوتییەکان بوون، هەروەها بەشێك لە لوللوو شیمورم بەشداربوون[٣١٥]. لە لایەکی تریشەوە، سەرەڕای ئەوەی کە ئاشوورییەکان ڕێکەوتنیان لەگەڵ تورووکودا هەبوو، بەڵام پێناچێت جێی بڕوا بووبێتن، چونکە (شمشی – ئەدەد) بە هاوپەیمانێتی لەگەڵ (دادوشا) پاشای (ئیشنۆنا) لەشکرکێشییەکیان کردەسەر (ئەراپخا)و (قابراو) داگیریان کردن[٣١٦]. لە دەقێکی پاشایەکدا هاتووە: "چوومە کیرخۆی (ئەراپخا)و پێکانی خواوەند (ئەدەد)م ماچکرد، و دواتر کاروباری وڵاتەکەم ڕێکخست"[٣١٧]، پێدەچێت دادوشا ئەو شارەی داگیرکردبێت، چونکە، ئیشنۆنا لەلای باشوورەوە هاتووەو (شمشی – ئەدەد) لەلای خۆرئاواوە، دواتر هەردوو هێزەکە لە کاشتەپە[٣١٨] بەیەك گەیشتوون[٣١٩]. بەڵام دواتر ناوچەکانی (ئەراپخا)، بەهۆی لاوازبوونی ئیشنۆنا و مردنی دادوشاوە، کەوتە دەستی (شمشی – ئەدەد)[٣٢٠]. لێرەبەدواوە بەهۆی نەبوونی سەرچاوەی مێخییەوە، پەیوەندی نێوان (ئەراپخا)و تورووکو نەزانراوە.

بەو شێوەیە شانشینی (تورووکو) بەشێك لە ناوچەکانی لەدەستدا، لەگەڵ ئەوەشدا کێشەی کەمی خۆراك و دانەوێڵە لەناوچەکەدا، هۆیەکی تری گرنگ بوو بۆ لاوازبوونی، لەوکاتەشدا کوواریی فەرمانڕەوای شمشارە پاڵیدایە (شمشی – ئەدەد)، بەوەش ناوچەکانی (ئوتوم) لە نزیکەی (١٧٨١)ی پێش زاییندا کەوتە ژێر سایەی ئاشوورییەکانەوە، لە بەرامبەردا، کوواری لە شوێنی خۆی مایەوە[٣٢١].

لەو ماوەیەی دەسەڵاتی (شمشی – ئەدەد)دا، (ئەراپخا) کەوتبووە دەست ئاشوورییەکانەوەو کردبوویانە ناوەندێکی خۆیان، چەند نامەیەکی لە (ئەراپخا)وە بۆ سەرکردەو فەرمانڕەواکانی سەربەخۆی ناردووە، بەتایبەتی لە هەوڵی داگیرکردنی (شیکشابوم – Ši - ik - ša - ab - bu - um$^{ki}$)[٣٢٢]دا، کە نامەیەکی بۆ کوواری ناردبوو، تا بەهاوکاری فەرمانڕەوای (ئەراپخا) (ئێتێللوم)، کە سەر بە (شمشی – ئەدەد) بوو، هێز بۆ داگیرکردنی ئەو شارە بنێرێت[٣٢٣].

لەوکاتەی کە (شمشی – ئەدەد) لە هەوڵی داگیرکردنی ئەو ناوچانەدا بوو، یاشوب – ئەدەدی پاشای ئەخازوم لە هاوپەیمانێك دەگەڕا، لە دوای داگیرکردنی (ئەراپخا)و (قابرا) بەشێکی زۆر لە گەورەکانی تورووکو چووبوونە (شیکشابوم)، گوتییەکانیش لە خوارووی زێی بچووکەوە هاوکارییان دەکردن، کوواریش هاوپەیمانێکی دلسۆزی ئاشوور نەبوو، بۆیە هەوڵەکانی سەرکەوتوو نەبوو[٣٢٤].

*** بوژانەوەی توروکو** (Turruku):

دوای داگیرکردنی ناوچەکە لەلایەن (شمشی – ئەدەد)ی یەکەمەوە، کۆمەڵێك لە پیاوماقوڵانی[٣٢٥] توروکو چووبوونە لای کوواری لە (شوشارا)، بەڵام سەرەرای ئاگادارکردنەوەی (شمشی – ئەدەد)، سیاسەتی بەرامبەریان زۆر خراپ بوو، ئەوەش بووە هۆی هەڵچوونێکی گشتی توروکو لە ناوچەکانی (ئوتوم)و خەڵکی ناوچەکە لە دژی کوواریو ئاشوور راپەرین، بەڵام (شمشی – ئەدەد) توانی بەرەو شاخەکان پاشەکشەیان پێبکات، ئەو رووداوانە لە نامەگۆڕینەوەکانی نێوان میرەکانی ماریو ئاشووردا، کە سەر بە (شمشی – ئەدەد) بوون باسکراوە، ئەم راپەرینە لەلایەن (لیدایا – Lidāya) سەرکردایەتی کرابوو، پێشتر (شمشی – ئەدەد) داوای لێ کردبوو، کە بۆ (شیکشابوم) بچێت، بەڵام ئەو بۆ (بوروللوم) لە نزیك شوشارا چوو[٣٢٦]. ئەو راپەرینە بووە هۆی لەناوبردنی دەسەڵاتی کوواریو دەسەڵاتی ئاشووری لە ناوچەکەدا، کە هاوکاتی سێیەمین ساڵی دەسەڵاتی (شمشی – ئەدەد) بووە[٣٢٧].

دوای ئەو رووداوانە، ئاشوورییەکان هەوڵێکی زۆریان بۆ زاڵبوونەوە بەسەر ناوچەکەدا دا، بە پێی نامەیەکی (ئیشمی – داگان) بۆ براکەی لە ماری، بەسەریاندا سەرکەوتوون، ئەوانیش بۆ شاخەکان کشاونەتەوە[٣٢٨]، بەڵام سەرکردە نوێکانی توروکو زۆر بەووردی دەجوڵانەوەو تاکتیکی نوێیان بەکاردەهێنا[٣٢٩]، دەرئەنجام بە سەرکردایەتی (زازییا – Zazia)ی سەرکردەی نوێی توروکییەکان، هەموو ناوچەکانی خۆرهەڵاتی دیجلە کەوتە دەستیانو (ئیکاللاتوم) لە خۆرئاوای دیجلەدا، کە یەکێك بوو لە ناوەندەکانی ئاشوور، کەوتە دەست زازییاوە، ئەگەر هێرشی گوتییەکان نەبوایە زۆری نەمابوو (شوبات – ئینلیلی) ناوەندی (ئیشمی – داگان)ی کوری (شمشی – ئەدەد) بگرن[٣٣٠]. لەو کاتەدا فەرمانرەوایەکی (نوزی) بەناوی (سومو – ئیپوخ – Sumu – Epuĥ -) هەرەشەی لە ئاشوورییەکان کردبوو، کە هاوکاری زازییا دەکات، بەڵام دوای ماوەیەك مردو نەزانراوە، کە ئایا پێش مردنی هەرەشەکەی بەجێهێناوە، یان نا؟[٣٣١]، لە دوای ئەوماوەیەدا چەندین جار ناوچەکانی (کەرانە)و (ئاشوور) کەوتبوونە بەر هێرشی توروکییەکانو شارێکییان بەناوی ماردەمان لەسەر دیجلە خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوەو (نەینەوا)یان کرد بە ناوەندێکی گرنگی خۆیان[٣٣٢].

دەوڵەتی توروکو زۆر فراوان ببۆوە، بەشێوەیەك کە لە خۆرهەڵاتەوە تا زاگرۆس، لە خۆرئاواوە تا خۆرئاوای دیجلە درێژببۆوە، کە دواتر دەبێتە بەشێك لە دەوڵەتی میتانی، ئەوەش هەرەشەبوو بۆ دەسەڵاتی دەوڵەتەکانی ئاشوور، کەرانەو بابل، بۆیە پەیوەندی دیبلۆماسی کەوتە نێوانیانەوە، تەنانەت نوێنەری زازییا لە بابلدا بەدیکراوە، پاشای ئاشووری (ئیشمی – داگان) چەند جارێك داوای پەیوەندیکردنی لەگەڵ (زازیا) کردبوو[٣٣٣].

لەناوچەکەشدا زازییا رۆڵێکی زۆری دەبینی، لەوکاتەی ئاڵۆزی کەوتە نێوان زازومی پاشای گوتییەکانو پاشایەکی شیمورم، لە ئەنجامی هێرشەکانی گوتی بۆ سەر ناوچەکانیان، پەنای بردە بەر زازییا، ئەمیش دایەوەدەست زازومی پاشای گوتی. لەلایەکی ترەوە، (کاکمییەکان) هێرشیانکردبووە سەر قابراو گرتیان. بەوشێوەیە ناوچەکە لەنێوان ئەو هێزانەدا دابەشبوو بوو[٣٣٤].

لەو ماوەیە بە دواوە، حەمورابی لە بابلدا، دەسەڵاتی بەهێز بوو بوو، لە ساڵەکانی سیو حەوتەمینی فەرمانرەوایەتیدا باسی لە بەزاندنی هاوپەیمانێتی ئیشنۆنا، مالیگیوم[٣٣٥]، گوتی، (ئاشوور)و (ئەنداریق)و[٣٣٦] توروکوی کردووە[٣٣٧]. بەڵام ئەمە مانای ئەوە ئەوەنیە حەمورابی بەسەریاندا زاڵ بووبێت، یان وڵاتەکانیانی داگیرکردبێت، چونکە ئەو سەرکەوتنە دوای ئەوە بووە، کە ئەو هاوپەیمانێتییە لە داگیرکردنی بابلەوە نزیك بوو بووەوە، هەروەها ناچاربووە، کە پەیوەندی لەگەڵ زازییادا ببەستێت، دواتریش، (سامسو – ئیلۆنای) (١٧٤٩ – ١٧١٤)ی پێش زایین کوری حەمورابی ژمارەیەك لە دیلەکانی جەنگی بۆیان گێراوەتەوە[٣٣٨].

بەوشێوەیە خورییەکان چەندین دەوڵەتیان بنیاتنا، کە بوونە زەمینەی سەرهەڵدانی دەوڵەتی میتانی لە سەدەی شانزەی پێش زاییندا.

*** باسی دووەم:**

**چاخی (خوری - میتانی) (١٧٥٠؟ - ١٣٣٠)ی پێش زایین:**

دوای (شمشی – ئەدەد)ی یەکەم، کورەکانی لەسەر تەختی ئاشوور جێیان گرتەوە، بەڵام نەیانتوانی دەسەڵاتو شکۆی دەوڵەت بپارێزن، دوای ماوەیەکی کورت دەوڵەتی ئاشوور پایەی جارانی لە دەستدا، لە بەرامبەردا گەلانی (گوتی، خوری، .... تاد) زیاتر لە ناوچە دەشتاییو بەپیتەکان دەردەکەوتن تەنانەت لە دوای جێنشینانی (شمشی – ئەدەد)، تۆمارەکانی ئاشوور وەستانو لەو کاتەوە پاشماوەو ناوە کەسێتییە خورییەکان لە ئاشووردا لە زیاد بووندا بوون[٣٣٩].

لە وڵاتی (بابل)یشەوە بەهەمان شێوە دوای حەمورابی دەوڵەتی ناوەندی بەرەو لاوازی دەچوو، جێنشینانی حەمورابی نەیانتوانی پایەو دەسەڵاتی (بابل) بپارێزن، ئەوەش بۆ هۆی جیاجیای دەرەکیو ناوخۆیی دەگەرێتەوە، شکۆو پایەی دەوڵەتی (بابل) لەلایەك بە کەسایەتی حەمورابییەوە پەیوەست بوو، لەلایەکی ترەوە، دەرکەوتنی دەوڵەتی کاشی کە بەشی باکووری بابلی داگیرکرد، هەروەها خورییەکان لە خۆرهەڵاتو باکووری دیجلەدا چەند دەوڵەتێکیان دامەزراند[٣٤٠]. گرنگترین ئەو دەوڵەتانە، شانشینی (ئەراپخا) بوو، لەنێوان زێی بچووك لەلای باکوورەوەو حەمرین لەلای باشووری خۆرئاواوەو رووباری دیالە–سیروان لە باشووری خۆرهەڵاتەوە.

*** یەکەم: شانشینی (ئەراپخا):**

کۆنترین ئاماژە بۆ (ئەراپخا) بۆ دەقێکی جوگرافی (سارگۆنی ئەکەدی) (٢٣٧٠ - ٢٢٨٤ )ی پێش زایین دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەو دەقە بریتییە لە کۆپییەکی سەردەمی بابلی کۆن، نەزانراوە، ئایا وەك خۆی نووسراوەتەوە، یان بە پێی سەردەمەکە ناوی شارەکە تۆمار کراوە، چونکە (سارگۆن) ئەو ناوچەیەی داگیر کردبوو[٣٤١]. دواتر لە سەردەمی بنەماڵەی سێیەمی ئوردا ناوی (ئەراپخا) هاتووە[٣٤٢]. وەك زانراوە بە پێی لەشکرکێشی پاشاکانیان لە خۆرهەڵاتی دیجلەدا بۆ سەر (ناوچەی ئەراپخا)، ئۆربیلوم و شوشرا، زۆربەی فەرمانڕەواو کەسایەتییەکان (خوری) بوون[٣٤٣]، بەڵام ناوی (ئەراپخا) لە ساڵنامەکانیاندا نەهاتووە.

سەرەڕای نەبوونی بەڵگە بۆ پایەی سیاسی (ئەراپخا)، پێدەچێت تا سەدەی هەژدەی پێش زایین پێش داگیرکردنی لەلایەن ئیشنونا و ئاشوورەوە، دەوڵەتە شارێکی سەربەخۆ بووبێ، لەو مێژووە بە دواوە خورییەکان چەندین دەوڵەتە شاریان لە خۆرهەڵاتی دیجلە دامەزراند[٣٤٤]، (ئەراپخا) یەکێك بووە لەو دەوڵەتەشارانە. خورییەکان لەو ناوچانەدا گەشەیان کردبوو و لەفراوانبووندا بوون، ئەوەش بووە هۆی پاڵ پێوەنانی کاشییەکان، کە لە باشووری ناوچەکانی (ئەراپخا)دا تا خانە لەسەر فورات بڵاوبووبوونەوە، دواتر بەرەو باشوور چوون و بابلیان داگیرکرد بوو[٣٤٥]. چونکە لەو کاتەدا (بابل) لەلایەن مورسیلی یەکەم پادشای هیتی لە نزیکەی (١٥٩٥)ی پێش زایین داگیر کرابوو، ئەمەش هەلێکی باشی بۆیان ڕەخساند کە وڵاتی (بابل) بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و دەوڵەتی کاشی دابمەزرێنن[٣٤٦].

لە لایەکی ترەوە وڵاتی ئاشوور هێزو توانای نەبوو، بە لەبەرچاوگرتنی گەشەکردنی خوری لە ناوچەکەداو بوونی شوێنەواری داگیرکاری لە ئاشووردا، پێدەچێت خورییەکان لەو مەسەلەیەدا ڕۆڵیان هەبوو بێت[٣٤٧]، چونکە لەسەردەمێکی دواتریشدا ئاشوور دەکەوێتە ژێر سایەی دەوڵەتی میتانیی- خوری[٣٤٨].

زانایان پێیان وایە کە خورییەکان لە سەدەی هەژدەی پێش زایینەوە ناوی (گاسوور)یان بۆ (نوزی) گۆڕیوە[٣٤٩]، بەو پێیەش خورییەکان تەنها بە شارو ناوەندە کۆنەکانەوە نەوەستاون، بەڵکو شاری نوێیان ئاوەدانکردۆتەوە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ فراوانبوونی خوری بەرەو باشوور لە سەردەمێکی پێش هێرشی مورسیلی یەکەم پاشای هیتی بۆ سەر بابل. بە پێی سەرچاوەکان ئەوە روون بووەتەوە کە لەو سەردەمەدا کۆچێکی فراوانی تری خوری لە باکوورو باکووری خۆرهەڵاتەوە دەستی پێکردبوو، ببووە هۆی جێگیر بوون و فراوانتربوونی دەسەڵاتیان، بە پێی هەندێ توێژینەوە دەردەکەوێت کە گۆڕانێك لە شێوەزاری خوری ڕوویداوە، وەك سەرەتایەك بۆ هاتنی ئەو شەپۆلە نوێیە، کە پێدەچێت کاریگەری ئارییەکان لەگەڵ ئەو شەپۆلەدا بووبێت[٣٥٠].

بەڵگەکانی ناوخۆی (ئەراپخا) بە تایبەت پێش ساڵانی (١٥٠٠ )ی پێش زایین زانیاری ناخەنەروو، لە کاتێکدا ئەرشیفی پاشایانی (ئەراپخا) نەدۆزراوەتەوە، کە پێدەچێت لە شاری (ئەراپخا - ئەلئێیلانی)دا بووبێت. بەڵام لە دەقەکانی نوزیدا دوو مۆری پاشایەکی (ئەراپخا) دۆزراونەتەوە، یەکێك لە مۆرەکان تایبەتە بە کاروباری زەوی و کێڵگەیی[٣٥١]، ئەویتر نەخشێکی[٣٥٢] لەسەردایە، لەلایەن (ئیتخی - تیشوپ - Itĥi-Teššup)ەوە تۆمار کراوەو خۆی بە پاشای (ئەراپخا) ناوزەند دەکات (ئیتخی - تیشوپ) پادشای وڵاتی ئەراپخی کوری (کیپی -تیشوپ)[٣٥٣].

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی دەقەکانی (نوزی)، شێوازی دارشتنی تۆمارەکان بووە بە بێ مێژوو، بۆیە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ نامەیەکی (شەوشتەتار)ی پاشای میتانی لە نزیکەی (١٤٣٠ - ١٤٢٠ )ی پێش زاییندا هاتووەتە سەر تەختی میتانی و پاش ئەوەی کە دەوڵەتی ئاشوورو (ئەراپخا) دەخاتە سەر ئیمپراتۆرییەتی میتانی، نامەیەك بۆ (ئیتخی - تیشوب)ی پادشای ئەراپخی دەنێرێت[٣٥٤].

بەو پێیەی سەرەتای فەرمانڕەوایەتی (ئیتخی - تیشوپ) بۆ پێش ئەو ماوەیە دەگەڕێتەوە، لە دەقێکی تری ئەرشیفی (نوزی) کە گرێبەستێکی (Maruti) یە لەنێوان تێخیپ - تیللا و کەسێکی تردا، لە کۆتایی دەقەکەدا ئەم دەستەواژەیە تۆمار کراوە: "لەو ساڵەی کە (ئیتخیا) بوو بە پاشا، ئەو گەیشتە پلەی پاشایەتی"[٣٥٥]، بەشێك لە دەقەکانی (نوزی) هاوچاخی سەردەمی ئیتخیا بوون، کە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی پانزەی پێش زایین دەگەڕێنەوە، وازانراوە دەقەکان بە گشتی لەنێوان (١٤٥٠-١٣٤٠ )ی پێش زایین بووە[٣٥٦]، (تێخیب - تیللا) هاوچاخی (ئیتخیا) بووەو دایکی تێخیپ - تیللا وینریکی (Winriki/ge) هاوچاخی کیپی - تیشوپ بووە[٣٥٧]، بەو پێیە ڕێی تێدەچێت ئەم لە نیوەی یەکەمی ئەو سەدەیەدا بووبێت[٣٥٨].

تا ئێستا گەورەترین ئەرشیفی کارگێڕی و ئابووری و یاسایی لە شانشینی (ئەراپخا)دا لە شاری نوزیدا دۆزراوەتەوە[٣٥٩]، ئەو بەڵگەنامانە لە کۆشکی میریدا (ekallu) دۆزراونەتەوە، بۆ کورانی پاشای (ئەراپخا) یان شاژن و لێپرسراوانی کۆشکی شارەکە دەگەڕێتەوە[٣٦٠]. گرێبەستەکانی تایبەت بە بازرگانی و زەوی و زارو تەنانەت کاروباری سەربازی و دادوەری ناوچەکانی (ئەراپخا) زۆربەی لە نوزیدا ئەرشیف کراوە[٣٦١]. نووسەرانی (نوزی)[٣٦٢] لە دەقەکانی شارەکانی تری ناوچەکەدا دووبارە دەبنەوە، پێدەچێت لەنێوان شارەکاندا گەڕۆك بووبێتن[٣٦٣]، ئەوانە هەمووی بەڵگەی ئەوەن کە (نوزی) ناوەندێکی گرنگی (ئەراپخا)، یان پایتەختی کارگێڕی شانشینی (ئەراپخا) بووبێت، چونکە وەك لە دەقەکاندا دەردەکەوێت پاشا پێگەیەکی هەمیشەیی نەبووە. ئەوە یەکێك لە جیاکارییەکانی پاشای (ئەراپخا) بووە[٣٦٤].

*** دووەم: دەوڵەتی میتانی ١٥٠٠؟- ١٢٦٢ پێش زایین:**

**١. میتانی لە سەرچاوە مێژووییەکاندا:**

لە کۆتاییەکانی سەدەی شانزەی پێش زاییندا ناوی میتانی لە سەرچاوە میسرییەکاندا دەرکەوت، بە تایبەت لە چوارچێوەی لەشکرکێشییەکانی (تحوتمسی یەکەم) (١٥٢٨ – ١٥١٠)ی پێش زایین بۆ سەر ناوچەکانی (فەلەستین‌و سوریا)، لەو تۆمارانەدا ناوەکە بە (Mati-te-ni)[٣٦٥] بووە، لەو مێژووە بە دواوە میتانی رۆڵێکی گرنگ لە مێژووی ناوچەکەدا دەبینێت.

ناوی میتانی لەسەردەمە جیاجیاکانی ئەو چاخەدا بە شێوەی جیاواز هاتووە، وەك خانیگەلبات، دەوڵەتی خوری، نهارینا و میتانی. سەبارەت بە خانیگەلبات، زیاتر لە دەقەکانی دەوڵەتی هیتی‌و ئاشووریدا تۆمار کراوە، لە کۆتایی سەدەی حەڤدەی پێش زاییندا (خاتوشیلی یەکەم) (١٦٥٠ – ١٦٢٠)ی پێش زایین پاشای هیتی بەردەوام هێرشی دەکردە سەر ناوچەکانی (ئالالاخ)، حەلەب‌و زنجیرەکانی تۆرۆس، لەو هێرشانەدا زۆر جار رووبەڕووی خورییەکان دەبۆوە، دوای داگیرکردنی (ئالالاخ)، حەلەبی کردە ئامانج، بەڵام بەهۆی رۆڵی خورییەکانەوە شکستی هێنا، تەنانەت لە چیرۆکێکی هیتیدا، خورییەکان (کوری خواوەند تیشوپ) بە رێگر لەبەردەم ئامانجەکانی دەزانێت[٣٦٦]. لە ساڵنامەیەکی تری خاتوشیلیدا زاراوەی خانیگەلبات وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو ناوچەیەی کە دەوڵەتی خوری لێبووە بەکاردەهێنێت: "خوری دوژمن لە خانیگەلباتەوە هاتە وڵاتەکەم، هەموو وڵاتی لێ سەندم، تەنها خاتوشا (پایتەخت)م بە دەستەوە مابوو..."[٣٦٧]. بەو پێیە دەبێت دەوڵەتی خوری لەسەرەتاکانی سەدەی حەڤدەی پێش زایینەوە لە خانیگەلبەتدا دامەزرابێت، چونکە لە کۆتایی ئەو سەدەیەدا بەشی زۆری ئاسیای بچووکی داگیر کرد، خاتوشیلی زۆر بە گران لێی رزگار بوو[٣٦٨]. هەروەها دواتر ئاشوورییەکان لەنێوان (١٣٦٠ – ١٢٠٠) پێش زاییندا ئەم زاراوەیان بۆ دەوڵەتی میتانی‌و ناوچەکانی باکووری خۆرئاوای ئاشوور، بە تایبەت بۆ ناوچەکانی سێگۆشەی خابور[٣٦٩]بەکاردەهێنا[٣٧٠]. جێی سەرنجە کە وا لە سەردەمی میتانیدا نووسەرانی (نوزی) زاراوەی خانیگەلباتیان لە جیاتی میتانی بەکاردەهێنا[٣٧١].

(ڤیلهێلم)[٣٧٢] پێی وایە کە زاراوەی (خانیگەلبات – خاڵیگەلبات) لە سەرچاوە ئەکەدییەکاندا لە چاخی بابلی کۆنەوە بەکارهاتووە، خاتییەکان هەر لەو تۆمارانەیان وەرگرتووە.

زاراوەیەکی تر کە لە سەردەمێکی جیاوازی زانیدا بەکار هاتووە، "دەوڵەتی، دەوڵەتەکانی خوری"یە. ئەم زاراوەیە هاوشانی خانیگەلبات لە سەدەکانی حەڤدەو شانزەی پێش زایین‌و دواتردا لەلایەن خاتییەوە بەکار دەهات، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دانیشتووانی وڵاتی میتانی خوری بوون، یان بە زمانی خوری دەدوان[٣٧٣]. ئەم زاراوەیە لە کۆتایی سەدەی شانزە، یان سەرەتای سەدەی پانزدە لەلایەن (ئیدریمی) پاشای ئالالاخ‌و هاوپەیمانی پاراتارنای پاشای میتانی بە کارهاتووە. وەك ئاماژەیەك بۆ پاراتارنا، زاراوەی (پاشای خوری) بە کاردەهێنا[٣٧٤]. دوای ئەو (توشراتا)ی پاشای میتانی، یەك جار (پاشای خوری) تۆمار کردووە[٣٧٥].

زاراوەی میتانی لە تۆمارەکانی پاشایانی میتانی خۆیانەوە تۆمار کراوە، بەڵام بە رێنوسی جیاواز، وەك: مەیتینی، میتانی، مەتیانی[٣٧٦]. فیرعەونەکانی میسر لە پاڵ مەیتانیدا زۆرجار (نهارینا)یان بەکار دەهێنا، سەرچاوە کەنعانییەکان ناوچەکانی میتانیان بە (مات نهریم – Mat Nahrime) تۆمار کردووە، هەردوو زاراوەی میسرو کەنعانییەکان کە زاراوەی جوگرافین، بە واتای وڵاتی دوو رووبار دێت[٣٧٧].

بە پێداچوونەوەی هەموو ئەو زاراوانە، دەردەکەوێت کە زاراوەکانی خانیگەلبات‌و نهارینا‌و مات نهریما، زاراوەی جوگرافین‌و مەبەست لە ناوچەی نێوان دیجلە‌و پێچی فورات بووە. بەڵام زاراوەی میتانی‌و خوری زاراوەیەکی (ئیتنیکی – سیاسی) بوون لە دوای سەدەی شانزدەوە بە دەوڵەتی گەورەی میتانیی خوری ووتراوە.

سەبارەت بە بنەڕەتی ناوی میتانی، تا ئێستا روون نەبۆتەوە کە لە چییەوە هاتووە، بەڵام تاکە ئاماژە بۆ ئەو مەسەلەیە ئەوەیە کە بەشی یەکەمی میتانی، واتە مەیتا (Maita) لە دەقەکانی نوزیدا ناوی کەسێك بووە[٣٧٨]، کە لە رووی زمانەوانییەوە پێکهاتەکەی زۆر روون نییە[٣٧٩]، (نی – Ni)ش پاشگرێکی خورییە[٣٨٠].. بەڵام وەك لەسەرەوەدا باس کراوە یەکەم جار ناوی میتانی بە (مەیتانی) هاتووە، لەگەڵ ناوی کەسایەتییەکدا رێك دەکەوێت. (یانکۆفسکا)[٣٨١] پێی وایە کە میتانی ناوی هۆزێکی خوری‌و بنەماڵە فەرمانڕەواکەیەتی‌و خانیگەلبات ناوی وڵاتەکەیە. بە لێکدانەوەی ئەم زانارییە لەگەڵ ئەورایەی، کە دەڵێت ناوی میتانی لە ناوی هۆزێکی خورییەوە هاتووە، پێدەچێت ئەو هۆزە خورییە لە سەدەی حەڤدەی پێش زایینەوە لەناوچەکانی دەریاچەی (ورمێ – ماتینی)وە بەرەو ناوچەکانی خابور چووبن‌و ناوی دەوڵەتەکەش میتانی لەوەوە هاتبێت.

**٢. رەگەزی میتانی:**

زانایان بە هەستیارییەوە دەڕواننە رەگەزی میتانی‌و دەوڵەتی میتانی، نەیانتوانیوە بە تەواوەتی مەسەلەی میتانی‌و رەگەزیان یەکلا بکەنەوە. ئەوەش بۆ ئاشکرانەبوونی پایتەختی دەوڵەتەکە دەگەڕێتەوە‌و بۆتە هۆی دروستبوونی لێڵی، چونکە زۆر بنەما هەن سەبارەت بە بوون‌و نەبوونی چەند کەسێکی ئاری رەگەز لە ناو دەوڵەتی میتانیدا.

زۆر جار زانایان دەوڵەتی میتانی لەنێوان خوری‌و ئارییەکاندا[٣٨٢] تێکەڵ دەکەن. بە لێکدانەوەی ناوی میتانی، دەردەکەوێت ووشەکە سەرەڕای نەبوونی هیچ پەیوەستییەکی زمانەوانی بە ئارییەوە، بە بوونی پاشگری خوری (ni) ووشەکە مۆرکێکی خوری بەسەردا زاڵدەبێت[٣٨٣]. هەروەها زاراوەی ماریاننی[٣٨٤] (Maryanni) کە لە میتانیدا بە چینی سوارەی سوپای میتانی وتراوە، کە لەلای هەندێ زانا

ڕەگەزێکی هیندی هەیە[٣٨٥]. بەڵام ئەو چینە لەلای ئورارتی و خوریدا هەبووە، واتە پێش ئەوەی لە ناوچەکانی خۆیان لێك بترازێن، (پێش هاتنی ئارییەکان)[٣٨٦]، لە وڵاتانی میتانی و سوریا و فەلەستیندا هەبوون، بەبێ ئەوەی عەرەبانەو ئەسپیان هەبووبێت، بەڵکو پاشا ئەو نازناوەی پێدەبەخشین[٣٨٧].

لە لایەکی تریشەوە یەکێك لە نازناوەکانی پاشایانی میتانی وەك پاراتارنا، (شەوشتەتار)و تەنانەت لە سەدەی سیانزەهەمی پێش زاییندا، (پاشای لەشکری خوری) بووە، ئەو نازناوەش بۆ سەدەی حەڤدەهەم دەگەڕێتەوە، کاتێك کە خورییەکان سەرکردایەتی هاوپەیمانیەتییەکیان لە دژی خاتو - شیلی یەکەم پاشای هیتی دەکرد[٣٨٨].

سەبارەت بە لێکدانەوەی زمانەوانی، تا ئێستا هیچ دەقێکی تەواوی (هیندۆ - ئاری) زمان لەناوچەکانی میتاندا لەبەردەستدا نییە، کە بۆ ئەو سەردەمە بگەڕێتەوە، بەڵکو هەندێ زاراوەی هونەری و ژمارەیی لە دەقێکی خوریدا دەربارەی ڕاهێنان و ئامادەکردنی ئەسپ بۆ بەکارهێنان لە جەنگدا لەلایەن کەسێکی خوری بە ناوی کیکولی نووسراوە، ئەو دەقە لەنێوان دەقەکانی (خاتوشا)دا دۆزراوەتەوە[٣٨٩]، هەروەها ناوی یەکەمی هەندێ پاشایانی دەوڵەتی میتانی لە نیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زاییندا، وەك: شوتارنا، پارتارنا... تاد، بردنەوەیان بۆ بنەرەتێکی ئاری جێی گومانە، چونکە تەنها لەبەر لێکنەچوونیان لەگەڵ ناوە خورییەکان و نەبوونی بنەرەتێکی زمانەوانی، دەبرێتەوە سەر ئاری[٣٩٠]. ئەوەی جێی سەرنجە کە زۆر جار پادشاکان بەر لە وەرگرتنی تەخت، ناوی خورییان هەبووە، دواتر پێویستیان بە نازناوی شاهانە[٣٩١] هەبووە[٣٩٢]. هەروەها هەردوو شازادە (تادو - خیپات و کیلو - خیپات)، کە بۆ فیرعەون دەنێرێن، ناوەکانیان خورییە[٣٩٣]. لەلایەکی ترەوە، ناوی چوار خواوەندی هیندی - ئاری وەك ڤیرونا، ناساتیاو... لەو وڵاتەدا بەکار هاتووە، بەڵام زیاتر لە ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکاندا بە تایبەتی لەنێوان شاتیوازای پاشای میتانی و شوپیلیولیومای پاشای هیتیدا (١٣٧٥ - ١٣٣٥) ی پێش زایین، بەشێوەیەکی لاوەکی بەرچاودەکەون[٣٩٤]. لە لایەکی تریشەوە (توشراتا) لە نامەیەکدا بۆ فیرعەون، تیشوپ بە سەروەر (سەید)ی خۆی ناو دەبات و بە ناوی تیشوپ داوای سەلامەتی فیرعەون دەکات و پەیکەری خواوەند شاوشکای خوری بۆ چاکبوونەوەی (ئەمنوفسی سێیەم) دەنێرێت[٣٩٥]. لە بەشێکی تری نامەکەیدا (توشراتا) دەڵێت: "..ئێمەی خوری.." بەو پێیە دانیشتووانی میتانی خوری بوون[٣٩٦]، نەك ئاری ڕەگەز.

هەموو ڕاو بەڵگەکانی سەرەوە دەریدەخەن، کە ڕەگەزێکی تەواو بە ناوی ئاری یان میتانی نەبووە، بەڵام بە بوونی ناوی کەسی و خواوەندو هەندێ ووشەی نا خوری کە تەنها لە ئارییەوە نزیکن، وا دێنە بەرچاو بەلای هەندێ زاناوە، کە تەنها کاریگەریی ئاری لەسەر دوایین شەپۆلی خوری لە سەدەی حەڤدەی پێش زاییندا بووبێت[٣٩٧]. بەڵام هەرچەندە دەبووایە ئەو کاریگەرییە لە خوری و ئورارتییەوە بۆ هیند بچووایە، وەك کارتێکردن و کارلێکردن، بەڵام تا دەوڵەت، بەهۆی ئەنجام نەدانی توێژینەوەی تایبەت، ئەو مەسەلەیە ئاشکرا نەکراوە[٣٩٨]، ڕایەکی تر هەیە کە پێی وایە بەشێك لە هیندو - ئارییەکان لە سەردەمانێکی زۆر زووترەوە لە بەشێکی گەورەتریانەوە ترازاون و دواتر لە ناوچەکانی دەریای ئورومیە لەگەڵ خورییەکاندا لە سەدەی حەڤدەی پێش زایینەوە بەرەو باشوورو خۆرئاوا کۆچیان کردوە، ئەو شوێنەی کە میتانی لێ دروست بووە، بەڵگەش بۆ ئەوە لە هەزارەی یەکەمدا مێژوونووسانی گریك ناوی ئەو دەریاچەیەیان بە (ماتینی) ناوبردووە، بەڵام ئەو گرووپە ئارییە دەستبەرداری کاریگەری شارستانییەتی خۆیان بوون و بەتەواوی لە نێو خوریدا تواونەتەوە[٣٩٩].

**٣. بارودۆخی سیاسی:**

تا ئێستا ناوی یەکەم پاشای میتانی لەسەر مۆرێك دۆزراوەتەوە، کە ناوی (شوتتارنا)یە دەشێت پێی بڵێین (شوتتارنا)ی یەکەم، وەك لە مۆرەکەدا تۆمارکراوە، "شوتتارنا (Šuttarna) کوڕی کیرتا (Kirta) پاشای مەیتینی (Maiteni)" [٤٠٠]، جێی سەرەنجە شوێنی ئەم مۆرە لەسەر تابلۆیەکی ئالالاخدا دۆزراوەتەوە، کە لەلایەن پاشایانی دواتری میتانییەوە بەکاردەهات[٤٠١]، بۆیە زانایان بە مۆری بنەماڵەی پاشایەتی دەزانن. هەر چەندە ناوی باوکی شوتارنا، (کیرتا) نەناسراوە، بەڵام هەندێك لە زانایان لەگەڵ ناوێکی تری هاوشێوە، کە لە چیرۆکێکی ئەفسانەیی ئۆگاریتیدا هاتووە بەراورد دەکەن. لەلایەکی ترەوە دەربارەی سەردەمی ئەم دوو پاشایە بیرو ڕای جیاواز هەیە، ئایا لە سەدەی شانزەی یان پانزەی پێش زاییندا فەرمانڕوایەتییان کردووە؟[٤٠٢].

پاشایەکی تری میتانی، کە تا ئێستا ناسراوبێت پاراتارنای یەکەمە (Paratarna)، کە لە نزیکەی پێش، یان دوای (١٥٠٠) پێش زاییندا دەسەڵاتی گرتبووە دەست، ئەم پاشایە توانی دەوڵەتی میتانی لەنێوان سێگۆشەی خاپوردا فراوانتربکاتەوە، لە دەوروبەری (١٤٧٠)ی پێش زاییندا شانشینی حەلەب (Alepo)، کە ماوەیەکی کەم بوو لە دەسەڵاتی هیتی لە دوای لە شکرکێشییەکەی مورسیلی یەکەم لە نزیکەی (١٥٩٥)ی[٤٠٣]پێش زاییندا سەربەخۆ بووبوو، دەوڵەتەشارەکانی نییا(Niya)و ئوما (Uma) و موکیش (ئالالاخ)[٤٠٤]و (کیززواتنا)[٤٠٥]، کە سنووریان دەگەیشتەوە سەر دەریای ناوەڕاست بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە[٤٠٦]، بەو شێوەیە سنووری دەوڵەتی میتانی گەیشتە ئەوپەڕی لە خۆرئاوادا. هەرچەندە سنووری باکوور نەزانراوە، بەڵام ناوچەکانی (تۆرعابدین)و دەشتەکانی ئامەدی دەوڵەتی گرتبووەوەو لە باکووری دیجلەدا هاوسنووری وڵاتی ئیشوواو ئەلش[٤٠٧] بوو، کە دانیشتووانەکەیان خوری بوون و پەیوەست بوون بە دەوڵەتی میتانییەوە[٤٠٨]. لە باشووری خۆرهەڵاتەوە ئاشوورو (ئەراپخا)[٤٠٩]و لە باشوورەوە شانشینی خانە لەسەر فوراتی ناوەڕاست، لەژێر دەسەڵاتی میتانیدا بوو[٤١٠].

ئەو فراوان بوونەی دەوڵەتی میتانیی خوری و

هاوپەیمانەکانی بووە هۆی دەست بەسەرداگرتنی ڕێگا بازرگانییەکانی ناوچەکە، بەڵام لەشکرکێشییەکانی سەر لە نوێی میسر لە سەردەمی (تحوتمسی سێیەم)دا (١٤٩٠ – ١٤٣٦)ی پێش زایین لە نزیکەی (١٤٥٧) پێش زایینو دواتر لە نزیکەی (١٤٤٧ – ١٤٣٨)ی پێش زایین تا ڕادەیەك بە شێوەیەکی کاتی کاریگەری هەبوو[٤١١]، چونکە بەشێکی زۆری ئەو ناوچانەی خۆرئاوای فوراتی داگیرکردو هاوپەیمانەکانی میتانی بۆ ماوەیەك کەوتنە ژێر دەسەڵاتی میسرەوە[٤١٢]. ئەوەش بووە هۆی بەهێزبوونی دەوڵەتە شاری ئاشوور[٤١٣]، کە توانیبووی وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ پەیوەندی بە میسرەوە بکات. دەوڵەتی هیتی لە باکوورەوە پاش ئەو ڕووداوانە توانی حەلەب داگیر بکاتەوەو دیاری لەگەڵ فیرعەوندا بگۆڕێتەوە[٤١٤].

سەبارەت بە بارودۆخی شانشینی (ئەراپخا)و شاری (نوزی) لەو سەردەمەدا، هیچ ئاماژەیەك لەبەر دەستدا نییە، چونکە دەقەکانی (نوزی)، کە تادەوڵەت دۆزراونەتەوە لە ڕووی کرۆنۆلۆجیاوە زانیاری زۆر بەدەستەوە نادەن، (یانکۆفسکا)[٤١٥] پێی وایە کە دەقەکانی پێش نەوەی پێنجەم وون بوون، یان تادەوڵەت پەیان پێ نەبراوە.

دوای (پاراتارنا) ماوەیەکی پڕبوو لە شەڕوشۆڕ، وەك لە سەرەوە ڕوون بۆوە کە سنووری دەوڵەتی میتانی کەوتە بەر هێرشی دراوسێکانو لەو ماوەیە لەو زانیارییانە زیاتر کە دەربارەی دەوڵەتی هیتیو میسر بوون، هیچی تر لەبەر دەستدا نییە. سەبارەت بەناوخۆی میتانی، وەك لە مۆرێکی میتانیدا کە لە نوزیدا دۆزراوەتەوە، ناوی پاشایەکی تری تێدایە، کە نوسراوە: "شەوشتەتار کوری پارساتەتار"[٤١٦]. بەو پێیەی کە دەقەکە لەلایەن (شەوشتەتار)ەوە تۆمارکراوە، ئەو پاشایە، پارساتەتار (Parsatatar) لە پێش ئەودا فەرمانڕەوابووە، واتە (پارساتەتار)ی باوکی (شەوشتەتار) لەنێوان پاراتارناو (شەوشتەتار) نزیکەی (؟ – ١٤٣٠)ی پێش زایین پاشای میتانی بووە، تا هاتنە سەر تەختی (شەوشتەتار).

پاشایەکی تری بەناوبانگی میتانی (شەوشتەتار Šauštatar) بووە، لە دوای لەشکرکێشییەکانی (تحوتمسی سێیەم)، لە دەورووبەری ساڵی (١٤٣٠)ی پێش زاییندا، دەرکەوت کە دەوڵەتی میتانی بەرەو لاوازی دەچوو، لەو سەردەمەدا (واشوکاننی – واشوگاننی)[٤١٧] پایتەختی میتانی بووە، دوای ڕێکخستنەوەی وڵات، دەستی دایە فراوانخوازییەکی زۆر، لە باشووری خۆرهەڵاتەوە، دەسەڵاتی میتانی گەیشتە وڵاتی لوللو[٤١٨]، لە باشوورەوە توانی دووبارە شانشینی (ئەراپخا) بخاتەوە سەر دەوڵەتی میتانی، بەوەش سنووری گەیشتە حەمرینو دیالە، لە خۆرئاواوەوە توانی دووبارە شاری ئالالاخ بخاتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیو نەوەیەکی ئیدریمی بەناوی (نیقمیپا – Niqmepea) لەسەر فەرمانڕوایەتی دانا[٤١٩].

پاش ئەوەی کە هەندێك لەناوچەکانی سووریای گرتەوە، هەنگاوێکی تری ئەوەبوو کە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ (فیرعەون)دا[٤٢٠] بەست[٤٢١]، تا بەتەواوەتی دەوڵەتەکەی بەهێز بکاتەوە، لە هەنگاوێکی تریدا بەهۆی لەشکرکێشییەکەوە، ئاشووری[٤٢٢] داگیرکردو دەسەڵاتی بەسەردا سەپاند، دواتر (شەوشتەتار) توانی بەهۆی پەیماننامەیەك دەوڵەتی (کیزواتنا)[٤٢٣] بە ئیمپراتۆریەتی میتانییەوە ببەستێتەوە کە پێشتر کەوتبووە ژێر دەستی خاتییەوە، بەو شێوەیە دەسەڵاتی گەیشتە (ئۆگاریت)، کە بەدرێژایی چاخە کۆنەکان بەندەرێکی بازرگانی نێودەوڵەتی بوو. بەو پێیەش هەموو ناوچەکانی شارستانییەتی خوری کەوتە ژێر سایەی میتانی[٤٢٤].

تا ئێستا بەتەواوەتی جۆری پەیوەندی نێوان میتانیو (ئەراپخا) نەزانراوە، بەڵام چەند بەڵگەیەك هەیە دەیسەلمێنن، کە (ئەراپخا) بەشێکی سەرەکی دەوڵەتی میتانی بووە[٤٢٥]. نامەکەی شەوشتوتار کە لە نزیکەی ساڵی (١٤٢٠)ی پێش زایین بۆ (ئیتخی – تیشۆپ) پاشای ئەو سەردەمەی ناردووە[٤٢٦]، یەکێکە لەوبەڵگانە. لە نامەکەدا (شەوشتەتار) داوا لە (ئیتخیا) دەکات کە زەویو زار لە ناوچەیەکی (ئەراپخا)دا بدات بە کەسێك بە ناوی ئوکی (Uki). (لیوی – Lewy)[٤٢٧] پێی وایە، کە پاشای میتانی دەسەڵاتێکی فیودالی (نیمچە دەرەبەگایەتی) لەسەر (ئەراپخا)دا هەبووە، چەند نوێنەرێکی خۆی لە شارەکانی (ئەراپخا)دا داناوە، کە بە (سوکالو – Sukalu)و (خالسوخلو – khalsukhlu) ناسرابوون، یەکێك لە ناسراوترین ئەو کارمەندانە (تێخیپ – تیللا)یە، لەرێگای ئەمانەوە کاروباری دابەشکردنی زەویو زاری وڵاتەکە بەڕێوە دەچوو[٤٢٨]. لە هەمانکاتدا، (نوزی) فەرمانڕەوایەکی هەبووە، کە بە (خەززانو – Ĥazzanu) ناسرابوو، (کوشی – خاریای) فەرمانڕەوای (نوزی) هاوچاخی (تێخیپ – تیللا)و (ئیتخیا) بووە[٤٢٩]. بەڵام لە ڕاستیدا تا ئێستا ئەرکەکانیان زۆر ڕوون نەبۆتەوە[٤٣٠].

بەڵگە هەیە کە بەردەوامی پاشای (ئەراپخا) لەسەرکار دەسەلمێنێت، لە دەقەکانی نوزیدا باس لە سەردانە بەردەوامەکانی پاشا بۆ کۆشكو شارەکان لە ناو شانشینەکەدا دەکرێت، کە لە بۆنە جیاوازەکاندا ئەنجامی دەدان[٤٣١]، لە کاتی جەنگەکانیشدا سەرپەرشتی لەشکری دەکرد[٤٣٢].

چەند هۆکارێك یارمەتی دەوڵەتی میتانی دابوو کە بتوانێت زوو هەڵسێتەوەو دەورووبەرەکەی بخاتەوە ژێر ڕکێفی خۆیو هیچ پاشایەکی تری میتانی وەك (شەوشتەتار) نەگەیشتە ئەو ئاستە، لە باکوورەوە دەوڵەتی هیتی کەوتبووە بەر هێرشو پەلامار لە هەموو لایەکەوە، بەتایبەت هۆزێك هەبوون کە بە (کاشکا)[٤٣٣] ناسرابوون لەباکوورەوە وە لەخۆرهەڵاتەوە خوری، کە بە هاندانو یارمەتی دەوڵەتی میتانی هێرشیان دەبرد، ڕۆڵێکی زۆری بینی[٤٣٤]، جگە لەوەی هێزی ماریانیی میتانی بە سوار چاکیو هونەری گەماڕۆدانو تیر هاویشتن ناسرابوون[٤٣٥].

دوای (شەوشتەتار)، (ئەرتاتاما) لە نزیکەی ساڵی (١٤٠٠)ی پێش زایین هاتە سەر تەخت، کە لەو کاتەدا ناوبەناوە (تحوتمسی چوارەم) (١٤٠٠ – ١٣٩٠)ی پێش زایین هێرشی دەبردە سەر سووریاو میتانی، بەڵام دوای ئەوەی کە (تحوتمسی چوارەم)، چوار جار داوای کچە پاشای میتانی

کردو (ئەرتەتامای) یەکەم رازی بوو کە کچەکەی خۆی بە فیرعەون بدات، پەیوەندی دبلۆماسی کەوتە نێوانیانەوە[٤٣٦]. هۆی دامەزراندنی ئەم پەیوەندییەی نێوان میسرو میتانی بۆ بەرژەوەندی هەردوولا لەبەرامبەر دەسەلاتی هیتی لەلایەك و باروودۆخی ناوخۆیی هەردوولا لەلایەکی ترەوە دەگەڕایەوە[٤٣٧].

(شوتتارنای دووەم) لە نزیکەی سالی (١٣٨٠)ی پێش زایین دوای باوکی هاتە سەر تەخت، ئەوەی لە سەردەمی ئەم پاشایەدا زانراوە، ئەوەیە کە لە هەموو ڕوویەکی سیاسی و سەربازییەوە توانیبوی هێزو شکۆی دەوڵەتەکە بپارێزێت، هەرێمەکانی سەر بە میتانی لە گەشەیەکی بەر چاودا بوون، بەتایبەتی ناوچەی (ئەراپخا) بووبووە ناوەندێکی ئابووریی گەورە. لە ڕووی سیاسییەوە پەرەی بە پەیوەندییەکانی لەگەڵ میسردا دابوو و پەیوەندییەکەی باوکی بە ناردنی کچێکی بەناوی (کیلو – خیپات Kilu - Ĥepat) بۆ (ئەمنۆفسی سێیەم) یان (ئەمنحوتب) (١٣٩٠ – ١٣٥٣)ی پێش زایین دووپات کردەوە[٤٣٨].

لە سەردەمی هەردوو پاشادا پەیوەندییەکانیان بەرەو پێش دەچوون، کاتێك کە فیرعەون نەخۆش کەوت و (شوتتارنا) بەمەی زانی، پەیکەری خواوەند (شەوشکا) (عەشتار)ی نەینەوای بۆ نارد، کە بە توانایی چاکبوونی نەخۆشی ناسرابوو[٤٣٩]. ئەوەش دەسەلاتی میتانی بەسەر ئاشووریدا دەسەلمێنێ، چونکە (نەینەوا) مەلبەندێکی پەرستنی شاوشکا بوو.

لە ڕووی سەربازییەوە (شوتارنا) لاوازی دەوڵەتی (هیتی – حیثی) بەهەل زانی و لە باکوورەوە لەشکرکێشییەکی بردە سەر هەرێمی (ئیشوا) خستیەوە ژێر دەستی خۆیەوە[٤٤٠].

دوای مردنی (شوتارنای دووەم)، (ئەرتەشومرا – Artašumra) بوو بە جێنشینی، ئەم پاشایە ماوەیەکی کورت فەرمانڕەوایەتی کرد[٤٤١]، پاش ماوەیەك ناکۆکی کەوتە نێوان بنەماڵەی فەرمانڕەواوە، بەتایبەت دوای ئەوەی کە (ئوتخی – Uthi)[٤٤٢] (ئەرتەشومرا)ی کوشت و برایەکی بچووکتری بەناوی (توشراتا – Tušrata) لە جێی دانا، تا بتوانێت دەسەلاتی خۆی بەسەردا بسەپێنێ، ئەوەش بووە هۆی پچڕانی پەیوەندی لەگەڵ میسری هاوپەیمانی، ئەم ڕووداوە ئالۆزییەکی زۆری خستە نێودەوڵەت و بەرەو لاوازی دەبرد، بۆیە پاش ماوەیەك (توشراتا)، بۆ سنوور دانان بۆ ئەم بارودۆخە، خۆی لە (ئوتخی) ڕزگارکرد، چونکە (ئوتخی) لە وڵاتەکەدا لایەنگری کەم بوو[٤٤٣].

هەنگاوی دواتری (توشراتا)، هەوڵدان بوو بۆ گێڕانەوەی پەیوەندی لەگەڵ میسردا. پاش دەستپێکردنەوەی گفتوگۆ، نامەیەکی دوورو درێژی[٤٤٤] بۆ ئەمنوفسی سێیەمی نارد، لەگەڵ کچێکی بە ناوی تادو – خیپات (Tadu - Ĥepat) کە درابوو بە فیرعەون، لە بەرامبەر هاوپەیمانێتی کردنی لە دژی دوژمنانی هەردوو وڵات، یارمەتی ئابووری، بەتایبەتی زێڕ، چونکە میسر بە زێڕ دەوڵەمەند بوو[٤٤٥]. دوای ماوەیەك دووبارە دەوڵەتی هیتی لەسەردەمی (تودخالیاش) لە باکووری خۆرئاواوە توانی (کیزواتنا)ی هاوپەیمانی میتانی بە پەیماننامەیەك ببەستێتەوە، بەوەش میتانی بەشێك لە هاو پەیمانەکانی لە دەستدا. کە لەنێوان شاوشتەتارو شنوشورای پاشای کیزواتنادا بەسترابوو[٤٤٦]، (توشراتا)، تا ئەو کاتە توانیبووی دەسەلاتی دەوڵەتی میتانی بپارێزێت، وەك لەگەڵ چەند نامەیەکدا[٤٤٧] دەستکەوتەکانی شەڕی لەگەڵ خاتیدا بۆ فیرعەون ناردووە[٤٤٨]، (توشراتا)، بۆ جاری دووەم ئامادەیی بۆ ناردنی خواوەند شاوشکا بۆ چاك بوونەوەی فیرعەون دەربری، هەرچەندە ڕاو بۆچوونی واهەیە کە لەو کاتەدا ئاشوور، لەلایەن پاشایەکییەوە (ئاشوور – ئوبلت) (١٣٦٥ – ١٣٣٠)ی پێش زایین خۆی لە دەسەلاتی میتانی ڕزگارکردبێت، چونکە لەنامەیەکدا بۆ (ئەخناتون) (ئەمنۆفسی چوارەم) (١٣٥٣ – ١٣٣٦)ی پێش زایین وەك پاشایەکی هاوتای (فیرعەون) خۆی پێشانداوە، بۆیە مەرج نییە ناردنی شاوشکا ئەوە بگەیەنێت کە ئاشوور لە ژێر دەسەلاتی میتانیدا بووبێت، بەوپێیەی شاوشکا لە پایتەختی (میتانی)شدا پەرستراوە[٤٤٩].

هەر چۆنێك بێت، پێناچێت ئوشراتا سەرقاڵی ڕووداوی لەو جۆرە بووبێت وەك لەنامەکانیدا دەردەکەوێت کە بۆ (ئەخناتون)ی ناردبوو، چونکە تەنها باس لە هێرشەکانی هیتی کردووەو ڕێی تێدەچێت ئەو نامەیەی (ئاشوور ئوبلت) کە بۆ ئەخناتونی نارد، لە دوای وەرگرتنی دەسەلاتی لە ئاشوور، بەتایبەت لە پاش ڕێکخستنی دەوڵەتەکەی بووبێت، ئەوەش پێویستی بە ماوەیەك هەبووە.

### ٤. لاوازبوونی میتانی و چارەنووسی (ئەرا پخا):

دوای ماوەیەك لە هاتنەسەرتەختی (توشراتا)، ناکۆکی لەسەر دەسەلات کەوتە ناو بنەماڵەی پاشایانی میتانییەوە، (ئەرتەتاما) خۆی بە جێگری شەرعی تەختی میتانی دەزانی، (شوپیلیولیوما)ی پاشای هیتی ئەوەی قۆستەوەو هاوکاری (ئەرتەتاما)ی دەکرد. لەلایەکی ترەوە (ئەرتەتاما) دوای ماوەیەك توانی پشتگیری (ئاشور – ئوبلت)ی مسۆگەر بکات و لەهەردوولاوە هێرشیان بۆ سەر میتانی برد[450]. سەرەتا دەوڵەتی ئاشووری لە باشوورەوەو دەوڵەتی ئەلش لەباکوورەوە[451]، هاوکات لەگەڵ (ئەرتەتاما)دا هێرشیان برد، لەو هێرشەدا توانیان بەشێك لە باکووری خۆرهەلاتی میتانی داگیر بکەن، بەوپێیە دەوڵەتێکی خوریی سەربەخۆ جیا لە میتانی دامەزرا[452]، کە پایتەختەکەی لە (تەئید)[453] بوو. (ئاشور – ئوبلت) بۆ ئەوەی شەرعییەت بە کارەکەی بدات، (ئەرتەتاما)ی بەهاوتای پاشای (خانیگەلبات) لە قەڵەمدا[455].

لە هەمانکاتدا، (شوپیلیولیوما) لە نزیکەی سالی (١٣٤٠)ی پێش زاییندا دەستی دایە لەشکرکێشییەکی فراوان بەرەو دەوڵەتی میتانی، ئەم هێرشە بووە هۆی لەناوبردنی هێزی میتانی وەك دەوڵەتێکی زلهێزو تەنها دەوڵەتێکی بچووکی لێمایەوە. سەرەتا (شوپیلیولیوما) لە ناوچەکانی سەرووی سەرچاوەکانی فوراتەوە (ئیشوا)ی هاوپەیمانی داگیرکرد، دواتر تا (تورعابدین)ی داگیرکرد، پاشان بەرەو باشوور کشا، تا لەفورات پەڕییەوەو گەیشتە ناوجەرگەی میتانی[٤٥٥]. لە بەرامبەردا (توشراتا) ڕاستەوخۆ ڕوو بە ڕووی هێزەکانی

هیتی نەبۆوە، بۆیە (شوپیلیولیوما) بەرەو خۆرئاوا چوو، تا لە فورات پەڕییەوەو لەو لەشکرکێشییەدا توانی لە ڕێگای هێزەوە هەموو دەوڵەتەکانی سەر بە میتانی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە[٤٥٦]، کە لەنێوان پێچی فورات و دەریای ناوەڕاستدا بوون، لەنێوانیاندا دەوڵەتەشاری کەرکەمیشی[٤٥٧] خۆری. دوای ئەوە بەردەوام بوو تا قادش[٤٥٨] چوو، کە سەر بە میسر بوو[٤٥٩]. لەوەبەدواوە ئەرکی داگیرکردنی ناوچەکانی تری سووریاو فەلەستینی بە کوڕەکەی (تلیبینو لوبەککی) سەرکردە سپارد، لەو کاتەدا هێرشێکی خوری و میسری بووە هۆی شکستی لەشکری هیتی، بەڵام (شوپیلیولیوما) هاتە مەیدانەوەو گەمارۆی (کەرکەمیشی) داو ناوچەکانی داگیرکردەوە. لە ناوەندی میتانییەوە (توشراتا) ئەو ڕووداوانەی بەهەل زانی و هێرشێکی گەورەی کردەسەر هیتی لە ناوچەی (ناخاش- نوخش) (لە باشووری حەلەب) و سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا، بەوەش سەلماندی هێشتا توانای بەدەستەوە ماوە، هەرچەندە دوای ماوەیەکی کەم دەوڵەتی میتانی بەهۆی باری ناوخۆوە نەیتوانی خۆی ڕابگرێت[٤٦٠].

بارودۆخەکە لە هەموو ڕوویەکەوە لە بەرژەوەندی (توشراتا) نەبوو، لەو ماوەیەدا چەند نامەیەکی ئاراستەی ئەخناتون کرد، بەڵام بە هۆی سەرقاڵ بوونی بە شۆڕشی ئایینی[٤٦١]، مەسەلە دەرەکییەکان سەرنجی ئەختاتونیان ڕانەدەکێشا[٤٦٢]، لەلایەکی تریشەوە دەوڵەتی میتانی ئەو زلهێزەی جاران نەبوو، کە میسر پشتی پێ ببەستێت، لە بەرامبەردا دانی بە واقیعداناو دەوڵەتی ئاشووری و هیتی و کاشی بەشیاوتر زانی، کە پەیوەندییان پێوە کردبوو. بەوەش (توشراتا) هاوپەیمانێتی میسری لە دەستدا.

دەوڵەتی میتانی لەناوەوەو دەرەوەدا بەرادەیەك شێواو بوو، کە بووە هۆی کوشتنی (توشراتا) لەلایەن کوڕێکی[٤٦٣] خۆیەوە، تا جێی باوکی بگرێتەوە، بەڵام لەو بارودۆخە ناسکەی میتانیدا لەتوانایدا نەبوو بەسەر بارودۆخەکەدا زاڵ ببێت. چونکە نەیارەکان لە هەموو لایەکەوە هێرشیان دەهێنا. (شوتتارنای سێیەم)ی کوری (ئەرتەتاما)ی دووەم[٤٦٤] بە پاڵپشتی دەوڵەتی (ئاشوور)و (ئەلش)، هێرشیانکردە سەر واشوکانی پایتەخت و داگیریانکرد، وەك لە دەقێکی دواتری شاتتیوازای کوری (توشراتا)دا هاتووە، (شوتتارنا) زۆربەی پیاوماقوڵانی میتانی دابوو بە دەست ئاشوور، بەوەش چارەنووسێکی نادیار چاوەڕوانی دەکردن، هەرچی سامانی شارەکەش هەبوو، کە پێشتر (شەوشتەتار) لە ئاشوور بردبوونی[٤٦٥]، بۆ ئاشووری بردەوە. (شوتتارنا) هەموو تیپەکانی سوارەی ماریاننی و گالیسکەو ئەسپەکانی سوپای میتانی بەرەو پایتەختە نوێیەکە برد[٤٦٦].

پاش ئەو ڕووداوانە دەوڵەتی میتانی زۆر بچووك بۆوەو دەسەڵاتی بەسەر ناوچە دوورەکاندا نەما، پێشتر (ئەراپخا) لەژێر سایەیدا بوو، لەو کاتەدا کەوتبووە بەر چاوتێبڕینی دەوڵەتەکانی دەورووبەری، وەك ئاشوورو کاشی. تا ئێستا زۆر ڕوون نییە، کە کام لەو دوو دەوڵەتە پێشتر هێرشیان بردۆتە سەر (ئەراپخا)و (نوزی)و شارەکانی تر. بەپێی دەقەکانی (نوزی)، یەکێك لەنەوەکانی تێخیپ – تیللا بە ناوی تاکو(Taku) کوری ئیناماتی لە ئاگادارکردنەوەیەکی حکومەت لە (نوزی)، داوای ئەوەی کردووە هەوڵ بۆ ئازادکردنی ئەو دیلانە بدات، کە لە هێرشێکی ئاشووریدا گیرابوون بەرانبەر بە (فدیە[٤٦٧])، لەو ڕاپۆرتەدا هەموو زیانەکان، کە لەو هێرشەدا لە خەڵکەکە کەوتوو بوو، دیاریکردبوو، وەك: کەلوپەلی سەربازی، زیانی گیانی لەناوچەکانی (تورشا)[٤٦٨]، بەو پێیە هێرشێکی ئاشووری کە لە سەردەمی تاکوی فەرمانڕەوای ناوچەی تورشاو (ئاشوور – دایانی)[٤٦٩] فەرمانڕەوای ناوچەی قابرادا بووە، بۆتەهۆی داگیرکردنی چەند شارێکی تری وەك قابرا، چونکە پێشتر ئەو شارانە لە لێواری لای ڕاستی زێی بچووکدا، دانیشتووانیان خوری بوون و سەر بەهەرێمی (نوزی) بوون[٤٧٠]. بەو پێیەش هێرشی ئاشووری پێش هێرشی کاشی ڕوویداوە.

پاشایەکی (ئەراپخا) توانیبووی پەیوەندی دیپلۆماسی لەگەڵ ئاشوورییەکاندا ببەستێت، چونکە ناوی دیپلۆماتێکی ئاشووری لەگەڵ ناوی پاشاکەدا تۆمارکراوە، کە لەو کاتەدا لە سەردانێکدا بووە بۆ شاری (ئولام)، نوێنەرە ئاشوورییەکە فەرمانڕەوایەکی ناوچەی (قابرا)ی سەر بە ئاشوور بووە[٤٧١]، لەلایەن ئاشوورییەکانەوە دەستیان بەسەردا گیرابوو، بەو پێیە هێرشێکی ئاشووری کە لە سەرەتای سەردەمی (ئاشور – ئۆبلت)دا کراوەتە سەریان[٤٧٢]. (لیوی)[٤٧٣] پێی وایە ئەو پەیوەندییەی نێوان ئاشوورو (ئەراپخا) بۆ هاندانی (شوتتارنا)ی سێیەمی میتانی دەگەڕێتەوە، چونکە (ئەراپخا) سەربە میتانی بووە. لە لایەکی تریشەوە (شوتتارنا)ی سێیەم هاوپەیمانی ئاشوور بووە، بە هێزی ئەوان توانی دەسەڵات لە (توشراتا) بسێنێت[٤٧٤].

لەو کاتەی کە (توشراتا) کوژراو (شوتتارنا) بەهاوکاری ئاشوورو ئەلشییەکان هاتبووە سەر تەخت، کوڕێکی تری (توشراتا)، بەناوی (شاتتیوازا – Šatti - Wazza)[٤٧٥]، لەو ڕەشەکوژییەی کە (شوتتارنا) لە دژی بنەماڵەی (توشراتا)و پیاوماقوڵانی میتانی ئەنجامیدا بوو ڕزگاری بووبوو، لەگەڵ ٢٠٠ گالیسکەی سەربازیدا، بەرەو (ئەراپخا) هەڵهات، لە دەقەکاندا ناوی شاتتیوازاو دارو دەستەکەی بەدی دەکرێن[٤٧٦]. وادەردەکەوێت (شاتتیوازا) لە هەوڵی بەدەستهێنانی هاوکاری کاشی بووبێت، بەڵام پاش ئەوەی کە هەموو ئەسپ و گالیسکەکانی لێسەندرا، لە پشتگیری کردنی بێ ئومێد بوو، بۆ (ئەراپخا) گەڕایەوە، دواتر لەوێوە بەڕێگای ماریدا بەرەو وڵاتی هیتی لەلایەن ئەراپخییەکانەوە بەڕێکرا[٤٧٧] و لەسەر ڕووباری (هالیس)دا، بە شوبیلیوما گەیشت، کە ڕازی بوو بە گێڕانەوەی بۆ واشوکاننی، بەڵام دووبارە (ئەرتەتامای دووەم) بە پاشاو شاتتیوازا بە جێنشینی دانرا[٤٧٨] و کچێکی لێ مارەکرد، بەرامبەر بەوەی، کە سنوورەکانی هیتی لە بەرامبەر ئاشوورو هاوپەیمانەکانی بپارێزێت[٤٧٩].

لە لایەکی ترەوە، (خوت – تیشوپ Ĥut - Teššup) کوری پاشای ئەراپخا؟، کە دواتر لە شەرەکانی (شیلو) دا سەرکردایەتی هێزێکی سوارەی گالیسکەکانی دەکات،

برێکی زۆر لە شتی بە نرخی وەك: زێڕو خۆراکی لە نوزییەوە پێگەیشت‌و لەگەڵ چەند کەسێکی تری ئەراپخاییدا کە شتەکانیان هەڵگرتبوو، لەسەر شەرەفی نوێنەری کاشیدا بەکار هێنراون‌و بۆ وڵاتی (بابل) (کاشی) برد، لە لایەکی ترەوە چوونی پاشا بۆ بابل‌و پێشکەشکردنی دیاری بەنرخ[٤٨٠] بۆ کردنەوەی پەیوەندی بووەو بەوپێیە (ئەراپخا) چۆتە ژێر سایەی دەولەتی کاشییەوە. هەروەها پاشای (ئەراپخا)، لەگەڕانەوەیدا لە وڵاتی ئەکەدەوە بۆ (ئەراپخا)[٤٨١]، کۆمەڵێك لە ئەندامانی بنەماڵەکەی لەگەڵدا بووە، لەوانە (خوت – تیشوپ)، کورەکانی تری‌و برایەکی، لە هەمووی گرنگتر شاژن بوو، کە بەڵگەیە بۆ ئەوەی لە ئەرکێکی دیبلۆماسییەوە گەڕابێتەوە[٤٨٢]. بە پێیی دەرکەوتنی (خوت – تیشوپ) لەگەڵ نوێنەری کاشیدا (ubâru of Akad)و[٤٨٣] هێنانی سەربازی کاشی لەگەڵ خۆیدا، پێدەچێت ئەوکارە سەرکەوتنی بەدەست هێنابێت[٤٨٤]، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتیش بوو بێت. ئەم کارەی پاشای (ئەراپخا) کتوپڕ بووە، چونکە پێشتر سەر بە میتانی بوو، بەو پێیەش پێدەچێت تووشی مەترسییەکی دەرەکی، وەك ئاشوورییەکان هاتبێت.

(ئەراپخا) لە ناوخۆیدا لە بارێکی نا ئاساییدا دەژیا، هەر لەو ماوەیەی، کە (شاتتیوازا) لە نوزیدا بوو، لە چەند لایەکی وڵاتەکەوە هێرشێکی دەرەکی لە ئارادا بوو. لە دەقەکانی نوزیدا، تا ئێستا هیچ ئاماژەیەك بۆ ناوی لایەنی هێرش بەر لە بەردەستدا نییە، بەڵام بە پێی ئەو زانیارییانەی لە بەردەستدان، دەرکەوتووە، کە لەنوزییەوە کەلوپەلی هەمەجۆری وەك: قەڵغان‌و کومی سەربازان لە کۆگاکانی نوزییەوە دەرهێنراون‌و بەسەر سەربازانی لەشکری (ئەراپخا) و (خانیگەڵبات)دا دابەشکراون، ئەو هێزەش لەلایەن پاشی (ئەراپخا)وە بۆ ناوچەکانی (نوزی) نێرا بوون[٤٨٥]. هەروەها خۆراك بۆ سەربازەکان گوێزراوەتەوەو لە هەمانکاتدا شەڕ لە (لوبدی)دا بەردەوام بووە[٤٨٦]. لەناوچەکانی باشوورەوە، لەشارەکانی (تلیبینیرا)[٤٨٧]و (دور – ئوبلا)وە شەڕ لەنێوان لەشکری کاشی‌و (ئەراپخا) دەستی پێکرد، لە هەموو لایەکەوە هاوکاری بەرەو ئەوناوچانە دەستی پێکرد، بەڵام لە نوزیدا کۆگا سەربازییەکان بۆ ناردنی چەك‌و پێداویستی والاکرابوون، لە دەقێکدا باس لە ناردنی هەزاران تیرو ڕم بۆ شاری (دور – ئوبلا) لە باشوورەوە کراوە[٤٨٨].

لە لایەکی ترەوە دوای ماوەیەك لە هێرشەکان، بەبۆنەی سەرکەوتنەکانەوە، ئاهەنگیان گێڕاوە، بەتایبەت بە بۆنەی ڕزگار بوونی (تلیبینیرا)و (ئیرخاخی)[٤٨٩]، بەڵام نەتوانراوە (دور – ئوبلا) ڕزگار بکرێت، بە پێی دەقەکان بەو بۆنەیەوە تیش – ئورخی هاوکاری بۆ ئەو ناوچانە بردووە[٤٩٠].

(ڤیلهێلم)[٤٩١]، پێی وایە لە ساڵی (١٣٤٠)ی پێش زایینندا بوو کە کاشییەکان هێرشێکی وێرانکەریان کردۆتە سەر دەوڵەتی (ئەراپخا)و تا زێی بچووکیان داگیرکردووە. لە دەقێکیدا (ئەدەد – نیراری)ی یەکەم (١٣٠٧ – ١٢٧٥)ی پێش زایین پاشای ئاشووری، لوبدی (داقوق) بە سنووری باکووری دەوڵەتی کاشی ناو بردووە[٤٩٢]، بەوشێوەیە (ئەراپخا) لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا دابەشکراو ئەو چاخەی کە لەلای زانایان بە چاخی (نوزی) ناو دەبەن، کۆتایی هات.

بەپێی شوێنەوارە مادییەکانیش، شوێنەواری وێرانکاری لە (نوزی)و[٤٩٣] (کوروخاننیدا)[٤٩٤] بەدی کراوە، بەڵام پێدەچێت دوای ئەو وێرانکاریەش تۆمارەکانی (نوزی) تا ماوەیەك بەردەوام بووبێتن، بەڵام دواتر بەهۆی هێرشێکی ترەوە بەتەواوەتی ناوچەکە لەلایەن هێزێکی دەرەکییەوە داگیرکراوە. (کیرا)[٤٩٥]، پێی وایە، کە تا ماوەیەك دواتریش دانیشتووانی ناوچەکە لە هەوڵی سەربەخۆبووندا بوون. هەر چۆنێك بووبێت لەو کاتەوە (ئەراپخا) بوو بە بەشێك لە دەوڵەتی ئاشووری‌و یەکێك بووە لە هەرێمە گرنگەکانی ئاشووری.



*** تەوەری سێیەم:**
**- ژیانی ئابووری:**

*** باسی یەکەم:**
**- کشتوکاڵ:**

کشتوکاڵ مێژوویەکی کۆنی هەیەو بۆ نزیکەی (٩٠٠٠) ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە، کاتێك مرۆڤ بۆ یەکەم جار لە ئەشکەوتەکانی ناو شاخەکانەوە بەرەو دۆڵەکان شۆڕبوونەتەوە، بە پێی شوێنەوارناسی، کشتوکاڵ لە زاوی چەمی، کریم شایەرو پاڵە گەورەدا بەدی کراوە[٤٩٦]، بەڕای زانایان چاخی کشتوکاڵی راستەقینە لە گوندی چەرموو وە دەست پێ دەکات، چونکە لە شوێنەکانی سەرەوەدا مرۆڤ جێگیر نەبووەو پەیوەستی زەوی نەبووە، بەڵام لە چەرمووەدا نزیکەی هەشت نەوەی لە دوای یەکتری تێدا بەدی کراوە، کە نزیکەی (٤٠٠) ساڵی خایاندووە[٤٩٧].

مێژووی گوندی چەرموو بۆ نێوان (٧ - ٦) هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە، لەو سەردەمانەدا مرۆڤ چاندنی دانەوێڵەی زانیوە، بەتایبەت گەنمو جۆ، هەروەها ئاژەڵی بەخێوکردووە وەك سەگو بزن، دواتریش ئاواییە کشتوکاڵییەکان لە پەرەسەندندا بوونو چەندین ناوچەی گرتۆتەوە، وەك (مەتارە) لە باشووری کەرکوكو شمشارە لە بتوێن، تەپەگەورە لە خۆرهەڵاتی نەینەوا، هەروەها چەندین ئاوایی تر لەخۆرهەڵاتی نزیکی کۆن، کە ئەو ناوچانە بەبنەرەتی دانەوێڵە دادەنرێن[٤٩٨].

کشتوکاڵ بەردەوام لە پەرەسەندندا بوو، بەڵام بەشێوەیەکی لەسەرخۆو بە ووردی، تا لە چەرمووەدا خەملیو دواتر بەهۆی بارودۆخی سروشتی، وەك ووشکە ساڵیو پەرەسەندنی ئامێرە کشتوکاڵییەکان، بە تایبەت پاش گواستنەوەی کشتوکاڵ لە بەرزاییەکانەوە بۆ رۆخی رووبارەکانو کۆبوونەوەی دانیشتووان بەشێوەیەکی چڕ تر لە جاران[٤٩٩]، بووەتە هۆی پەیدابوونی شارەکانی ناوچەی زورگو لیتە دەشت، چونکە لە شاخەکاندا بە هۆی شێوەی تۆبۆگرافی زەویو رادەی باشی باران، بواری ئەو پەرەسەندنە کەمتر بووە[٥٠٠].

لە چاخە مێژووییەکاندا، کشتوکاڵ زیاتر پەرەی دەسەند، بە تایبەت لە بواری ئاودێریدا تا کۆتایی هەزارەی سێیەمو نیوەی هەزارەی دوەمی پێش زایین، ئەوەش بووە هۆی گۆڕانی گەورە لە کۆمەڵگاداو یاسای کشتوکاڵیو ئاودێرییو خاوەندارێتیو ...تاد هاتە ئاراوە، وەك یاساکانی سۆمەرو دواتر بابلی کۆن بە تایبەتی یاساکەی حەمورابی[٥٠١]. ناوچەی گاسوور لە سەردەمی ئەکەدیدا ناوچەیەکی کشتوکاڵی پڕ بایەخ بووە، وەك لە ئەرشیفەکانی ئەو سەردەمەدا دەردەکەوێت، تارادەیەکی زۆر بەرووبوومی کشتوکاڵی لەو ناوچەیەدا پەرەی سەند بوو، بەتایبەت دانەوێڵەو پەروەردەکردنی ئاژەڵ[٥٠٢].

*** یەکەم: خاوەندارێتی زەوی:**

خاوەندارێتی زەوی کشتوکاڵی بۆ سەردەمانێکی زۆر کۆنتر دەگەڕێتەوە، بەڵام بەهۆی نەبوونی تۆمارەکانەوە، ناتوانرێت بە ئاسانی مێژووی سەرەتاکەی روون بکرێتەوە، چونکە داهێنانی نووسین لە وڵاتی سۆمەردا بۆ هەزارەی سێیەم پێش زایین دەگەڕێتەوە. لە سەرەتادا زەویو زارەکان زیاتر لە ژێر دەستی پەرەستگاکاندا بوون، بەڵام خاوەنداری تاك بەشێوەیەکی لاوەکی هەبووە[٥٠٣]، بە سەرهەڵدانی سیستەمی پاشایەتیو ئیمپراتۆریەتی ئەکەدی سیستەمی خاوەندارێتی پەرستگا بەرەو لاوازی دەچوو، چونکە پاشا بووە خاوەنداری سەرەکی، ئەویش زەوییەکانی دەدایە دەستی کەسانێك بۆ بەڕێوەبردنی وەبەرهێنانی، وەك ئەندامانی بنەماڵەی پاشایەتی، سەرکردە سەربازییەکان، بەرامبەر بە داهاتێکی دیاریکراو، ئەم سیستەمە لە سەردەمی ئەکەدیدا لە (گاسوور) بەدی کراوە[٥٠٤].

لە هەزارەی دووەمدا گۆڕانکاری بەسەر چالاکییە ئابوورییەکاندا بە گشتی هات، خاوەندارێتی کەوتە ژێر کاریگەریی ئەو گۆڕانکاریانە، بەگشتی دەشێت بە ئابووری هەزارەی دووەمی پێش زایین بڵێین (ئابووری کۆشکی پاشایەتی)، لە زۆر ئەو ناوەندانەی، کە خوری باڵادەست بوون، وەك (نوزی، شاغربازار، ئۆگاریت)[٥٠٥]، چونکە لە زۆربەی ناوەندە ئابووریو سیاسییەکانی ئەو سەردەمانە، ئەم دیاردەیە باوبووە[٥٠٦].

لە ناوچەکانی (نوزی)و (ئەراپخا) چەندین جۆری خاوەندارێتی هەبووە، لە دەقە ئەرشیف کراوەکانی بنەماڵەو کۆشکەکانی نوزیدا کەبەپێی وەرگرتنو دابەشکردنی دانەوێڵە ریزکراون، بڕی وەرگرتنی دانەوێڵەی ساڵانە کە لە ئاواییەکانەوە[٥٠٧] بۆ کۆشك چووە لە (نوزی)[٥٠٨]. پێدەچێت کۆشك خاوەندارێکی گەورە بووبێت.

ئەو زەوییانە لەلایەن گوندنشینەکانەوە[٥٠٩]، بەرامبەر بڕێك داهات دەکێڵران. لێرەدا کۆشك وەك دەزگایەکی کارگێڕی، یان لێپرسراوێتی میری بۆ چاودێری کشتوکاڵی دەولەت دەردەکەوێت، چونکە بەشێکی زۆر لەو داهاتانە لەلایەن کۆشکەوە بەسەر دەستو پێوەندەکانی پاشادا دابەش دەکران، وەك سەربازو سەرکردەکانیان، پیشەگەران، نووسەران، کەنیزەکان، کۆیلەکانی کۆشك[٥١٠].

لەلایەکی تریشەوە پاشاکان خۆیان زەویی تایبەتیان هەبووە، وەك لە دەقەکاندا دەرکەوتووە کە بە دەستەواژەی (دێمەکانی فلانە پاشا) ناوبراون، کە جیاواز لە موڵکەکانی کۆشك وەبەردەهێنران[٥١١]. هەروەها شاژنەکانیش موڵکی تایبەت بە خۆیان هەبووە، کە لەلایەن خەڵکی گوندەکانەوە دەکێڵران[٥١٢]. کورانی پاشاش موڵکی زۆریان هەبووەو یەکێك بوون لە خاوەنداره هەرە گەورەکان، بەهەمان شێوە خزمو کەسانی تری بنەماڵەی پاشایەتی زەوییان پێدەدرا کە بیکێڵنو بووبوون بە خاوەنداری گەورە لە ناوچەکەدا[٥١٣].

هەندێ خاوەندارێتی تریش هەبوون کە لە سەرەتای دەسەڵات گرتنە دەستی خوریدا لە (ئەراپخا) سەریان

هەڵدا، بە تایبەت ئەو زەوییانەی کە دەدران بە سەرکردە سەربازییەکان، ئەمانە لە سەرەتاوە لە هەوڵی بە دەستهێنانی خاوەندارێتی بوون، تا دەستیان لە بەرهەم هێناندا هەبێت، کە جووتیارەکان شان بە شانی کۆیلەکان دەیانکێڵا. هەروەها چینی باڵای سوارەکان کە بە (مەری یەنی نا) ناسرابوون، لەلایەن پاشاوە زەوییان پێ بەخشرابوو، ئەمانە دواتر بوون بە خاوەنداری گەورەو دەوڵەمەند بوون[٥١٤].

جگە لەو زەوییانە، خاوەندارێتی تریش هەبووە، کە بۆ تاکەکان دەگەڕایەوە، ئەم زەوییانە زیاتر ناوچەی دێمییەکانی دەگرتەوەو (مشاع) بوونو کڕینو فرۆشتنی لەسەر نەبووە، بەرامبەر کێڵانی ئەو زەوییانە، کۆشك باجی لە جوتیاران دەسەند کە بە (ئیلکو – ilku)[٥١٥] ناسراوە[٥١٦]. جۆرێکی تریش لە خاوەندارێتی زەوی هەبووە، کە بەو پێیەی یەکەم جار زەوییە بکەوتایەتە دەستی کەسێك، بە تایبەت دوای ووشك کردنی گۆماو، یان چاککردنی زەویدا، خاوەندار بۆی هەبووە کڕینو فرۆشتنی پێوە بکات[٥١٧]. بە گشتی دەربارەی خاوەندارێتییە تایبەتییەکان زانیاری زۆر نییە، چونکە تەنها بنەماڵە گەورەکان توانای ئەرشیفکردنی موڵکەکانیان لە تۆماری تایبەتدا هەبووە، بۆیە دەقە تۆمارکراوەکان وێنەیەکی ڕاستەقینە نادەن بەدەستەوە[٥١٨].

### * دووەم: چالاکییە کشتوکاڵییەکان:

جۆری کشتوکاڵ بەپێی ژینگەو هۆکارە سروشتییەکان دیاری دەکرێت، کە ڕۆڵێکی کاریگەرییان بۆ ڕادەی سەرکەوتنی هەربوارێکی کشتوکاڵی هەیە، چونکە هەر جۆرە کشتوکاڵێك پێویستی بە جۆرێك خاکی دیاریکراو هەیە، لە هەمان کاتدا پێویستی بەڕادەیەکی ئاو (باران بارین، ئاودێری) دیاریکراو هەیە. بۆ نموونە بەروبوومی زستانە زیاتر پێویستی بە درێژبوونەوەی وەرزی ساردو خاکی لیتەیی هەیە، وەك گەنم. کە دەبێ نزیکەی شەش مانگ بارانی هەبێتو بەرگەی هەموو جۆرە خاکێك ناگرێت. لە کاتێکدا جۆ پێویستی بە ڕێژەیەکی کەمتر لە باران هەیەو بەرگەی گەرماو شۆرەکات دەگرێت. ئاژەڵداریش پێویستی بە لە وەرگای تایبەت هەیە. بەڵام بزن پێویستی بەو مەرجانە نییە. بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافی ناوچەی کەرکوکەوە، کە دەکەوێتە سەر هێڵی پانی فێنکی مام ناوەند، بۆ بەروبومی کشتوکاڵی شیاوە، چونکە لەگەڵ تووندرەویی بیابانەکانو ناوچەی شاخاویدا جیا دەکرێتەوە، چالاکییە کشتوکاڵییەکانی هەمەجۆرن، وەك لە خوارەوەدا ڕوون کراوەتەوە: چاندن، ئاژەڵداری.

**١. چاندن:**

**أ. کشتوکاڵی دێمی:**

ئەو بەروبومانەش زیاتر بەروبوومی زستانەن، چونکە ئاوو هەوای کوردستان بە گشتی، دەکەوێتە ناوچەی هەرێمی ئاو هەوای دەریای ناوەراست[٥١٩].

ناوچەکانی کەرکوك دەکەوێتە ناو دەشتو بانەکانی هەرێمی زورگ، لەنێوان هەرێمی شاخاوی لە باکوورو باکووری خۆرهەڵاتو لیتە دەشت لە باشوورو بانی جەزیرە لە خۆرئاوادا. ئەم ناوچەیەش تارادەیەکی باش بۆ کشتوکاڵ شیاوە، بە تایبەتی تا بەرەو باکووری خۆرهەڵاتی بچین داباڕین زیاتر دەبێت، لەنێوان (٥٠) سم لە باکوورو (٢٠) سم لەلای باشوورەوە ڕادەی باران بارینی ساڵانەیەتی[٥٢٠].

بەو پێیەی کە باران بارین لە دەشتاییەکانی کەرکوكو حەمریندا بە شێوەیەکی ناجێگیر دەبارێت، کە (نوزی) دەکەوێتە ئەم ناوچەیەوە، بووەتە هۆی سەرهەڵدانی کشتوکاڵی دێمی، بەتایبەت دانەوێڵەی وەك، گەنمو جۆ لە زستاندا[٥٢١]. بەڵام ناوچەی گردو بەرزاییەکانی زیاتر بۆ لەوەڕگا شیاوە[٥٢٢].



**ب. کشتوکاڵی ئاودێری:**

زەوییە بەر ئاوەکان لە (نوزی)و دەوروبەریدا ڕۆڵێکی گرنگیان لەبەرهەمهێنانی کشتوکاڵیدا هەبووەو ڕووبەرێکی فراوانی گرتبووەوە. بەڵگەش بۆ ئەمە هەڵکەوتەی شارەکانی (نوزی)و (ئەراپخا)و (تورشا)و.. تاد، لەسەر ڕووبار بوون، یان کەناڵی ئاویان هەبووە[٥٢٣]. ژمارەیەکی زۆر لە ڕووبارو کەناڵی ئاوی بەو ناوچانەدا تێپەڕ دەبوو. تەنها لە دەوروبەری نوزیدا (٦) کەناڵی ئاوی لە دەقە مێخییەکاندا زانراوە، لە (ئەراپخا)دا بەگشتی نزیکەی (٢٨) کەناڵی ئاوی هەبووە[٥٢٤].

زەوییە بەر ئاوو زەوی دێمییەکان لە دەقەکانی نوزیدا جیاکراونەتەوە، تەنانەت لە سنووری یەك گونددا ئەم دیاردەیە بەدی کراوە، وەك: کێڵگە بەرئاوەکان بە (AŠÀ. Šīqu)، ئەو کێڵگانەی کە هاوسنوور بوون لەگەڵ ڕووباردا بە (atappu. ÌD. ĥirītu)و کێڵگە دێمییەکان بە (ul Ša Šiqi) لە یەکتر جیاکراونەتەوە[٥٢٥]. ئەم کەناڵە ئاوییانە هەندێکیان سروشتی بوون، بەڵام هەندێکی تریان هەڵکەندراوبوون، لەو ناوچانەدا، کە لەتوانادا بووبێت ئاوی بۆ ڕابکێشرێت جێبەجێدەکرا، وەك لە دەقەکاندا هاتووە کارمەندی تایبەت بە چاودێری کەناڵە ئاوییەکان (gugalu) هەبووە، کە ئەرکی، گرنگی دان بووە بەو کەناڵە ئاوییانەو ڕێکخستنی نۆرە لەنێوان کێڵگەکاندا بۆ سوودبینین لە ئاودێری، هەروەها کەناڵی ئاوی نوێ ئەگەر پێویستی کرد[٥٢٦].

دوو هۆکاری سەرەکی هەبوون لەپشت بوونی ژمارەیەکی زۆر لە کەناڵی ئاودێری‌و سوود وەرگرتن لێیان، یەکەمیان، هەبوونی ئەو بەروبوومانەی کە لەبنەڕەتدا بەروبومی بەرئاوین، وەك سەوزە، دانەوێڵەی هاوینە (کونجی، دارمیوەو دارستانەکان). دووەمیان، بەروبوومی زستانە، بەتایبەت گەنم‌و جۆ، تەنها لەکاتی ووشکە سالیدا، بۆ قەرەبووکردنی ئەو کەم بارانییە، جوتیار لە ڕێگەی ئاودێرییەوە کێڵگەکانی ئاو دەدا، لەم بارەیەوە لە دەقێکدا هاتووە "MU Ša in - né - er - Šu - ma ù la - a l - şi - dú - uŠ". واتە (ئەو ساڵەی کە زەوییەکان تۆمکران، بەڵام نەدوورانەوە). (زاکانینی – Zaccagnini)، تێبینی ئەوەی کردووە کە ئەو ناوچەیە لە شاری ئولامم (Ulamme) بووە، کە کەناڵی ئاوی‌و ڕووباری لێ نەبووە، ئەوەش بەهۆی ووشکە ساڵییەوە بووە، ناوچەکانی تریش لە هەمان ساڵدا بەرهەمیان باش بووە، چونکە پشتیان بە ئاودێری بەستبوو[٥٢٧]. پێدەچێت ئەو دیاردەیەش زۆرجار دووبارە بووبێتەوە، چونکە دەکەوتە ناوچەیەکی بارانی نامسۆگەر[٥٢٨]. هەرچەندە بەرەو باشوور بچین ئەم دیاردەیە زیاتر، بەڵام بەرەو باکوور کەم تر دەبێتەوە. سەبارەت بە بوونی پرۆژەی بەنداو بۆ گلدانەوەی ئاو، تەنها (تەها باقر)[٥٢٩]، ناوی بەنداوێکی لەسەر ڕووباری (عوزێم) نوسیوە کە (دمیرەقبو)یە.

*** گرنگترین بەروبوومە کشتوکاڵییەکان:**

وەك لە سەرەوەدا ڕوون بووەوە، ناوچەکانی (نوزی) تارادەیەکی باش بۆ کشتوکاڵ شیاو بووە، لە دەقەکانی (نوزی)و شارەکانی تریشدا ئەم ڕاستییە سەلمێنراوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دەقانە بەوردی زانیاری لەسەر کشتوکاڵ کردن ناگرێتە خۆی، وەك دیاریکردنی وەرزە کشتوکاڵییەکان، ئامێرە کشتوکاڵییەکان، ئەوەی زانیاری تێدایە دەربارەی وەرگرتن‌و دابەشکردنی دانەوێڵەیە لە کۆشکدا، کە زانیاری باش دەربارەی برو جۆری بەروبوومی کشتوکاڵی دەدەن بە دەستەوە، لە کێڵگەو گوندەکانەوە بۆ کۆشك گواستراوەتەوە، بێگومان ئەوەش لە وەرزی دروێنەدا بووە، بەشێك لەو داهاتانە لە گەنجینەدا بۆ وەرزی چاندنی داهاتوو هەڵدەگیران‌و بەشێکی تری بۆ مەبەستە خزمەتگوزارییەکانی کۆشك دابەش دەکران[٥٣٠]، وەك زانراویشە ئەو ئەرشیفانە بەپێی ڕیزبەندی کارگێڕی، یان دادوەری بوون[٥٣١]. گرنگترین بەروبومەکان ئەمانەن:

**أ. دانەوێڵە:**

دانەوێڵە بە گرنگترین بەروبومی کشتوکاڵی دادەنرێت، کە تا ئێستاش وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی خۆراکی کۆمەڵگا دەزانرێت، لە کۆنەوە ناوچەکانی کەرکوکی دەوڵەت مەلبەندێکی چاندنی دانەوێڵە بوون و یەکەم جارلەم ناوچەیەوە مرۆڤ پێی ئاشنا بووە[٥٣٢]. گرنگترین بەروبومی دانەوێڵە جۆو گەنم، و.. تاد. بوو. بەپێی دەقەکانی (نوزی) (جۆ – Šeātu) زیاتر لەم ناوچانەدا چێنراوە[٥٣٣]، ڕێی تێدەچێت هۆیەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە گەنم زیاتر پێویستی بە ئاو هەبووە، و زۆرتر بە هۆی دەردی کشتوکاڵییەوە بەرهەمهێنان کەم دەبووەوە، بەتایبەت شۆرەکات، کە بەهۆی ئاودێرییەوە زیاد دەکات[٥٣٤]، هەروەها لە نوزیدا سەرچاوەی سەرەکی خۆراك بووە کە بە بێ (خومرە) نانی لێدروست دەکرا[٥٣٥]. جۆ لە زۆر بواردا سوودی هەبووە، وەك خۆراکی ڕۆژانەی مرۆڤ‌و ئاژەڵ‌و بۆ تۆمکردنی لە ساڵی داهاتودا، یان وەك دراو بەکاردەهات، بەشێوەیەکی فراوان وەك کرێی خزمەتگوزاری بەکاردەهات، لە بواری پیشەسازیشدا بیرەی لێ دروست دەکرا، هەروەها لە بۆنە ئاینییەکاندا لە پەرستگاکاندا پێشکەش دەکرا[٥٣٦].

یەکێك لە دانەوێڵە گرنگەکانی تر، گەنمە (Kibtu)، کە بەشێوەیەکی فراوان چاندنی لەو ناوچانەدا لەپاش جۆوە دێت، بەپێی ئەرشیفەکانی (نوزی) لە کۆشکدا وەردەگیراو دابەشدەکراو لە زۆر بواردا سوودی لێ وەرگیراوە، وەك مامەڵەی بازرگانی[٥٣٧].

**ب. کونجی:**

وەك زانراوە کونجی ڕووەکێکی هاوینەیە، بەو پێیەش لە زدوییە بەرئاوییەکاندا چێنراوە، کە پشت بە ئاودێری دەبەستێت. جگە لە خۆراك، ڕۆنی کونجی یەکێك بووە لە ئامانجە سەرەکییەکانی چاندنی کونجی، ناوچەکانی (نوزی) ژینگەیەکی شیاوی چاندنی کونجی بووە[٥٣٨]. بەڵام لە دەقەکانی نوزیدا باس لە تۆم‌و ڕۆنی کونجی کراوە، کە بە (ŠE - Ì - Giš) یان (ŠE - Ì - GIš - W) ناسراوە، چاندنی لە چەند ناوچەیەکدا زۆر گونجاو بووە، وەك: (ئەپیناش – Apenaš)، (تورشا – Turša)و (تیمنتاش – Tementaš)،

بەرهەمی باشی هەبووە[٥٣٩]. هەروەها لە دەقەکاندا ناوی چەند کرێکارێك براوە کە لە کێڵگەکانی کونجیدا کاریان کردووە[٥٤٠].

**٢. ئاژەڵداری:**

سامانی ئاژەڵ لایەنێکی گرنگی دیکەی بواری کشتوکاڵە، سەرەڕای ئەوەی کە بە پلە دوو لە دوای سامانی ڕووەکی دانراوە، بەڵام گرنگی تایبەتی خۆی هەبووە، دەوڵەتیش بایەخی خۆی لە دەست نەداوە. مرۆڤ لە سەرەتای چاخی کشتوکاڵییەوە ئاژەڵی پەروەردەکردووەو سوودی لێ بینیوە، چ وەك خۆراك، یان بەکارهێنانی خورییەکەی بۆ جلوبەرگ. زانایان وای بۆ دەچن کە پێش هەموو ئاژەڵێك سەگ ماڵی کراوە، چونکە وەك پارێزەر، یان بۆ یاریکردن لەگەڵ منداڵدا بەکارهاتووە، چونکە ئاژەڵێکی جێگیرە. لە دوای سەگ بزن ڕاگیراوە، بۆ شیرو مووەکەیو پاشماوەکەی، لە چەرمووداوەك ئاژەڵێکی ماڵی لە ئاژەڵەکانی تر ڕوونترە[٥٤١]. لە چاخە کۆنەکانەوە مرۆڤ زەوییە بەپیتو بەرەکەتەکانیان بۆ دانەوێڵەو زەوییەکانی تر، بەتایبەت ناوچە دوورو گردو بانەکان وەك لەوەڕگای ئاژەڵ بەکاردەهێنا[٥٤٢].

**أ. مەڕو بزن:**

بزن لە ناوچەکانی نوزیدا بە گشتی زۆر بایەخی هەبووە، هەر چەندە لە دەقەکاندا مەڕ زیاتر دێتە بەرچاو، بەڵام بە پێی پاشماوە ماددییەکان بزن زیاتربووە[٥٤٣]. هێمای سۆمەری (UDU) بەکارهاتووە کە واتای بەرخ دەگەیەنێت، جاری واش هەبووە زاراوەی (UDU.MÍ) بۆ مەڕو بزن هاتووە[٥٤٤].

ئەم دوو ئاژەڵە بۆ مرۆڤ بایەخی زۆریان هەبووە، بۆیە لە کۆمەڵگا کۆنەکاندا گرنگی پێدراوە، چونکە بەرهەمێکی جۆرا وجۆرو زۆریان هەیە، وەك، شیر، خوریو موو، هەروەها لە مامەڵە بازرگانییەکاندا وەك بایی (پێوەری کاڵا) بەکارهاتوون[٥٤٥]، لە پەرستگا کانیشدا لە کۆنەوە وەك قوربانی، بەتایبەت لە جەژنو بۆنەکاندا پێشکەش بە خواوەندان کراوە[٥٤٦].

تۆمارە ئەرشیفکراوەکانی (نوزی) بە ووردی لە بارەی قەبارەو تەمەنو جۆر بەپێی باشو خراپیو بڕینەوەی خوریو موو، زانیاری بەدەستەوە دەدەن، کە بەزاراوەی (G - qazuu) یان (ša baqnu) بڕینەوەی ئاژەڵ تۆمارکراوە[٥٤٧].

بەخێو کردنی بزنو مەڕ بەشێوەی مێگەل بووە، کەلەلایەن شوانەکانەوە ئەنجام دەدرا، ئەوەش بەهۆی گرێدانی پەیمانی تایبەت بەو کارە[٥٤٨]، یان جاری وا هەبووە ئەم کارە دەخرایە ئەستۆی کۆیلەکان. ئەمانە بەرامبەر بە کۆشك، یان ئەگەر موڵکی تایبەت بوایە بەرامبەر خاوەنەکەی لێپرسراو بوون[٥٤٩].

**ب. ڕەشە ووڵاخ:**

لە دەقەکانی نوزیدا زاراوەی تایبەت بەم جۆر ئاژەڵانە زیاتر بەواتای (گاو گامێش) هاتووە، وەك، (GUa) یان (GUD.NITAMEŠ)، و (GU.MÍ) یان (GU.ÁB) بۆ مێینەکانیان بەکارهاتووە[٥٥٠]. بەشێوەیەکی کەمتر زاراوەی (GUD.sal ālpu) بۆ مانگا بەکارهاتووە[٥٥١].



ڕەشە وولاخ بە گشتی لە چاخە کۆنەکاندا بایەخیان زۆر بووە، بەتایبەت (گا)، چ لە ئاستی خێزاندا، بۆ دابینکردنی پێداویستی ماڵەوە لە شیرو گۆشت، چ لە بواری بازرگانیدا، بۆ کرین و فرۆشتنی ئاژەڵەکان، یان گۆشتەکەی و کەوڵەکەی. بەڵام گا لە کۆنەوە بۆ کرداری کێڵان، یان بۆ ڕاکێشانی بارو گواستنەوەی کاڵای بازرگانی بەکاردەهات[٥٥٢].

بایەخ پێدان بە (گا) لەم ناوچانەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە جگە لە سوودی ئابووری ئەم ئاژەڵە بۆ ئەو سەردەمە، ناوچەکەش زۆر لە بار بووە بۆ بەخێو کردنی، بوونی کەناڵی ئاوی و رووبار لە ناوچەکەدا یارمەتی دەری باش بوون، چونکە (گا) پێویستی بە ئاوی زۆر هەیە بە تایبەت لە وەرزی هاویندا، بۆ فێنککردنەوەی پلەی گەرمی لەشی[٥٥٣].

لە بوارە ئایینییەکانیشدا هێمایەکی بەرچاوی شوێنەوارەکانە، چونکە (گا) ڕەمزی خواوەند تیشوپ و مانگاش ڕەمزی خواوەند خیبات، ژنی تیشوپ بووە، کە دوو پەرستراوی گرنگی خوری بە گشتی و (نوزی) بە تایبەت بوون[٥٥٤].

### * باسی دووەم:
### پیشە و پیشەسازی دەستی:

پیشەسازیی لە چاخە کۆنەکاندا بایەخێکی گەورەی لە ژیانی ئابووریدا هەبووە، چونکە زۆر لە پێداویستییەکانی ڕۆژانەی کۆمەڵی کۆنی دابین کردووە، کەلوپەلی ناوماڵ، یان ئامێرە کشتوکاڵییەکان یان پێداویستی سەربازی دەوڵەت بووبێت. لە ناوچەکانی (ئەرابخا)داو بە تایبەت لە (نوزی) برێکی زۆر لە کەلوپەلی دروستکراو دۆزراونەتەوەو لەدەقەکانیشدا زۆر جار ئاماژە بەو کەلوپەل و پیشەگەرانە کراوە، وەك گەرەك یان کۆشکی تایبەت بە پیشەگەران، وەك: ئاسنگەران، دارتاشەکان، سواڵەتکەران، تەونکەران و.. تاد. بەڵگەیەکە بۆ ڕۆڵی ئەو پیشانە لە پێکهاتەی ئابووری نوزیدا، تا ئەو ڕادەیەی چووەتە بواری بازرگانییەوە.

مێژووی زانینی پیشەسازیی لە ناوچەکەدا زۆر کۆنەو بۆ چاخە بەردینییەکان دەگەڕێتەوەو بەردەوام لە پێشکەوتندا بووە، بەڵگەش بۆ ئەوە دۆزینەوەی برێکی زۆری تەشی و ئامێری بەردی و، کانزایی و...تاد، لە چەرموو، مەتارە، شمشارەو تەپە گەورە، بەڵام پیشەسازیی لەو سەردەمانەدا زۆر سادەو سەرەتایی بووەو زیاتر کەلوپەلەکان بە دەست دروستکراون.

بەپێی بەڵگە شوێنەواری و نووسراوەییەکان لە هەزارەی دووەمی پێش زاییندا، (نوزی) تا ڕادەیەکی زۆر لەم ڕووەوە پێشکەوتوو بوو، لە خوارەوەدا یەك یەك باسیان لێوە دەکرێت:

#### أ. ڕستن و چنین:

ڕستن و چنین لە نوزیدا ڕۆڵێکی گرنگی لە ژیانی ئابووریدا دەبینی، بۆیە دەوڵەت زیاتر لە پیشەکانی تر گرنگی پێداوە. هەرچەندە لە ئەرشیفی کۆشکەکاندا بە شێوەیەکی ووردو سەربەخۆ باس لەم پیشەسازییە نەکراوە، بەڵام لە چوارچێوەی دابەشکردنی خۆراك و کرێ بەسەر پیشەگەراندا دەردەکەوێت کە زۆرینەی کەسەکان لە تەونکەران بوون[٥٥٥]. تەنانەت لەو دەقانەدا ئاماژە بە کۆمەڵگا (کۆشکی) تەونکەران کراوە[٥٥٦]، هەروەها زۆر لە دەقەکانی تەبەنی دەربارەی پیشەی تەونکەران بووە[٥٥٧].

دەسەڵاتدارانی کۆشك لە نوزیدا - وەك پێشتر ئاماژەمان بۆی کرد بایەخێکی زۆریان بە پەروەردەکردنی مەڕو بزن داوە، ئەوەش بۆ بەدەستهێنانی خوری و موو، هەروەها بۆ زۆربوون بووە، وەك لە ئەرشیفەکاندا دەردەکەوێت، کە چۆن ساڵانە لە وەرزی دیاریکراودا، برینەوەی مەڕ (baqūnu) ئەنجام دراوە[٥٥٨]. هیچ ئاماژەیەك لە گرێبەستە بازرگانییەکاندا نییە کە مەڕ بازرگانی پێوە کرابێت، بەڵکو بۆ بە دەستهێنانی خوری و مووەکەی بووە بۆ دروستکردنی جلوبەرگ.

بە ڕای (ئەلجادر)[٥٥٩]، ئەو ناوچانە بۆ پەروەردەکردنی ئاژەڵ، بە تایبەت بۆ خورییەکەی زۆر شیاوبوون، چونکە خوری مەڕ لە رووی شێ و گەرمی و ساردییەوە پێویستی بە ناوچەی مام ناوەند هەیە، بۆ ئەوەی تووشی نەخۆشی مشەخۆرییەکان (طفیلي) نەبێت، کە دەبێتە هۆی تێکدانی خورییەکەی. لە دەقەکانی نوزیدا بۆ ئاماژەکردن بە قوماش و جلوبەرگ زاراوەی (TUG) بەکارهاتووە، کە مەبەستی لە خورییە[٥٦٠]. بەڵام زۆر جار بۆ دروستکردنی جلوبەرگی ڕەنگا و ڕەنگ، بۆیاخ و خوری ڕەنگا و ڕەنگیان لە ناوچەکانی فینیقیا و ئۆگاریتەوە دەهێنا[٥٦١].



بەو پێیەی کە زۆربەی گرێبەستەکانی تەونکەران لەگەڵ کۆشك، یان لەگەڵ بەرپرسانی کۆشکدا ئەنجام دراوە[٥٦٢]، زۆر جار وا دێتە بەرچاو، کە ئەم پیشەیە تەنها لەلایەن کۆشکەوە قۆرخ کرابێت، تەونکەرانیش کۆیلەی کۆشك بووبێتن[٥٦٣]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەسانێکی ئازاد لە ژن و پیاو لەو بوارەدا کاریانکردووە، تەنانەت (ئەلجادر)[٥٦٤] پێی وایە کە لەنێوان تەونکەرانی نوزیدا کۆیلە نەبووە، بەڵکو ئازادبوون. لە لایەکی تریشەوە ژمارەیەك لەوانە لە ماڵی خۆیاندا تەونیان دامەزراندووەو قوماشیان دروست دەکردو دواتر لەگەڵ بازرگانێکدا بۆ فرۆشتنی کاڵاکان و هێنانی کەرەستەی خاو رێك دەکەوتن. بەو پێیەش کەرتی تایبەتیش لەو بوارەدا رۆڵی هەبووە[٥٦٥].

دروستکردنی قوماش بە دوو قۆناغدا تێدەپەڕێت: یەکەمیان، رستنی خورییەکە، بەهۆی تەشییەکی لەبەرد، یان لە دار دروستکراو[٥٦٦]، دووەم: چنین، ئەویش بەهۆی (تەون) دەبێت کە بریتییە لە دوو ستوون، لە سەرەوە بە دوو رایەڵ بە شێوەی ئاسۆیی بە یەکترەوە بەستراونەتەوە، کە تا ئێستاش لە کوردستاندا لە نێو هەندێك لە ماڵەکاندا ماوە[٥٦٧].

خوری سەرچاوەیەکی سەرەکی بووە بۆ دروستکردنی جلوبەرگ لە نوزیدا، چونکە هیچ ئاماژەیەك بۆ بەکارهێنانی لۆکە نییەو لەو سەردەمەدا چاندنی نەزانرابوو. بەڵام پێدەچێت لە سنوورێکی دیاریکراودا قوماشی کەتان بەرهەم هاتبێت، ئەم جۆرە قوماشە زیاتر بەرگی رایەخ (Ša maiapli)ی لێ دروستکراوە، کە تایبەت بووە بە رایەخی پاشایان و کۆشکەکان[٥٦٨]. رەنگی قوماشەکان جۆراوجۆر بووەو بە موروی زیوین رووپۆش دەکران و بایەخی زۆریان بە رازاندنەوەدا دەدا، جلوبەرگەکانی (نوزی) بە (Nuzutu) واتە قوماش و جلوبەرگی (نوزی) ناسرابوون[٥٦٩].

ئەو بایەخە زۆرە کە بە قوماش دەدرا بە مەبەستی ناردنە دەرەوە بوو، بۆیە قوماش لە پێشەوەی هەناردەی (نوزی) بووە[٥٧٠]، لە ناوخۆشدا لە مامەڵەکانی زەوی و زار (Maruti)[٥٧١] و قەرزو کرێ (Titennutu)دا[٥٧٢] بەکارهاتووە.

**ب. کانزاکاری:**

کەلوپەلی کانزایی لە پاشماوەکانی نوزیدا دۆزراوەتەوە، کە رێی تێدەچێت لە ناوخۆدا دروست کرابێت[٥٧٣]، بە تایبەت ناوی چەند کەسێك لە ناو لیستی دابەشکردنی خۆراکی کۆشکدا هاتووە کە ئاسنگەربوون (awil nappâĥu)[٥٧٤].

یەکێك لە پیشەسازییە گرنگە کانزاییەکان کە لە نوزیدا هەبووە، پیشەسازیی برۆنزییە، برۆنز خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە پیشەسازیی، چونکە لە بنەڕەتدا خۆی لە کەرەستەی ترەوە دروستدەکرێت، ئەویش مس و تەنەکەیە (القصدير)[٥٧٥]، دواتریش هەر شتێك پێویست بێ لێی دروست دەکرێت. کەلوپەلە برۆنزییەکان زۆرن، وەك: کەلوپەلی ناوماڵ لە قاپ و تاس و شتی تر، کە لە نوزیدا برێکی زۆری لێ دۆزراوەتەوە[٥٧٦]، هەروەها کەلوپەلی سەربازی وەك خەنجەرو شمشێرو رمو تیر[٥٧٧]. بەڵام گرنگترین کەلوپەلی سەربازی کە لە دەقەکاندا باس کرابێت کومەو قەڵغانی سەربازانە لە نوزیدا، کە بە زاراوەی گورپیسو (gurpisu) بۆ ئەو جۆرە کومەیان دەربڕیوە، کە نەخشراوو شەپۆلاوین، پێدەچێت بۆ سەربازان دروستکرابێت، زاراوەی (kursimetu) بۆ ئەو کومانە بەکارهاتووە، کە بەسەر سەرکردە سەربازییەکانی خانیگالبات (میتانی) دابەشکراوە[٥٧٨].

لە دەقێکدا ناوی ئاسنگەرێك، خوتیپ – تێللا (Ĥutip-tilla) هاتووە، کە برێك برۆنزی، بۆ دروستکردنی (٦) سەرکڵاو (خودە) وەرگرتووە[٥٧٩].

**ج. پیشەسازی سواڵەت (الفخار):**

سواڵەت زۆرترین پاشماوەکان پێك دەهێنێت کە لە پشکنینەکاندا دۆزراونەتەوە، بەو پێیەی کە لە هەموو بوارێکدا بەکارهاتووە، چونکە نرخی هەرزان بووەو دروستکردنیشی ئاسانترەو زووتر ئەشکێت[٥٨٠]، بوو بووە پیشەیەکی سەرەکی و لە دەقەکانی نوزیدا ئاماژە بە سواڵەتکەران[٥٨١] کراوە، (یانکۆفسکا)[٥٨٢] پێی وایە شوێن یان کۆشکی تایبەتییان هەبووە، کە بە (دیمتو – پەخاراشو – dimtu Paĥĥarašwe) ناسراوە.

سواڵەت لە بنەڕەتدا لە قوڕ دروستدەکرێت، کە پێشتر بە پاککردنەوەی قوڕەکە ئامادە دەکرێت، پاشان لەسەر ئامێرێکدا دادەنرێت، کە بە چەرخۆکە دۆلاب ناسراوە، دواتر بە هۆی سوڕاندنی چەخۆکە، وەستاکە بە ئارەزووی خۆی بە دەست شێوازەکەی دەردەکات. کەلوپەلەکانیش بریتین لە تاس و گۆزە (بۆ هەڵگرتنی شلەمەنی وەك ڕۆن)[٥٨٣]. هەروەها لە کەلوپەلە دۆزراوەکانی تر وەك: تەشی، قاپ، پەیکەری مرۆڤ، تەنانەت خشتی دیوارو تابلۆکانی نووسین جۆرێکن لە سواڵەت، کە لە دوای سوورکردنەوەیان لە تەنووردا رەق دەکرێن و دەبنە ئەو کەلوپەلانەی سەرەوە[٥٨٤].

**د. خۆراك:**

سەرەڕای ئەوەی کەرەستە خۆراکییەکان لەو بابەتانەن کە بە تێپەڕبوونی کات لە ناو دەچن و پاشماوەکانیان بەدی ناکرێت بەڵام بە پێی دەقەکان ئاماژە بە هەندێکیان دەکرێت کە لە بنەڕەتدا کەرەستەی سروشتی نەبوون، بۆیە دەبێ لە رێگای دەست تێوەردانی مرۆڤەوە ئامادەکرابێت. وەك: رۆن.

**ە. رۆن:**

سەرچاوەکانی رۆن جۆراوجۆرن، دەشێت ئاژەڵی یان رووەکی بن، (کرۆس – Cross)[٥٨٥]، پێی وایە کە لە نوزیدا کونجی سەرچاوەی سەرەکی رۆن بووە، لەگەڵ ئەوەشدا دەقەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە بەزی بەراز سەرچاوەیەکی سەرەکی رۆن بووە، واتە توانەوەی بەزەکە. بەڵام بەو پێیەی کە لە سەرچاوەکاندا ئاماژە بە بەروبوومی ئاژەڵی وەك: مانگا، مەڕو بزن کراوە، ئەوانەش سەرچاوەیەکی تری رۆن بوون. هەر چۆنێك بێت لە دەقەکاندا باس لە دەرهێنانی رۆن لەو جۆیە کراوە کە رۆنی لێ دەردەچێت واتە کونجی (ŠE.GÌŠ.Ì)، یان (ŠE.Ì.GIŠ)، پێوەری تایبەت بە شلەمەنی هەبووە، کە رۆنی شلی پێ پێوراوە، وەك (qūm. tallu)[٥٨٦]. دەرهێنانی

ڕۆن لە دانەوێڵەدا، بە تایبەتی لە کونجی، بەهۆی هارینو گوشینی دانەوێڵەکە دەبێت، بەڵام بۆ بەدەستهێنانی ڕۆنێکی روون بۆ پاڵاوتنی، پێویست بە موو یان قوماشێك بووە. بەو شێوەیە (٢٠٪)ی دانەوێڵەکە دەبێتە ڕۆن. لەسەرچاوەکانیشدا زۆر جار ئەو ڕۆنە لە بۆنە ئایینییەکان لە پەرستگاکاندا دابەش کراوە[٥٨٧].

و. شووشە:

پیشەسازیی شووشە لە کۆنەوە هەبووە، بەڵام لە هەزارەی دووەمی پێش زاییندا زیاتر پەرەی سەندووە، هەرچەندە زانیاری تەواو دەربارەی سەرچاوەکانی شووشە نییە، بەڵام لە ناوچەکانی بانی خۆرئاوای عێراقی ئێستادا، جۆرێك لە لم هەیە کە بە لمی شووشە ناسراوەو دەوڵەت سوودی لێ دەبینرێت، لە لایەکی تریشەوە لە عەگەرگوف پایتەختی کاشییەکاندا پاشماوەی هەمان جۆری شووشەی (نوزی) دۆزراوەتەوە[٥٨٨]، بۆیە ڕێی تێدەچێت لەو ناوچانەوە هێنرابێت.

لە پاشماوەکانی نوزیدا چەند جۆرێك شووشە دۆزراونەتەوە، وەك موروو پارچەی تر، کە بۆ جوانکاریو نەخشو نیگاری دیوارەکان[٥٨٩]و کەلوپەلەکانی تریش وەك کەلوپەلی ناوماڵ وەك، جەرە[٥٩٠]و بوتڵی شووشە کە پێدەچێت بۆ دەرمانسازی بەکارهاتبێت[٥٩١]. شووشەکانی (نوزی) بە گشتی لە جۆری (فسافسائی)نو تەنها لە (تەل ئەلرەماح)دا دۆزراوەتەوە، کە بۆ ساڵی (١٤٠٠)ی پێش زایین دەگەڕێتەوە، بە تایبەت لە ڕووی نەخشو نیگارەوە[٥٩٢].

ز. دارتاشی:

دار یەکێکە لە مادە ئەندامییەکانو بۆ ماوەیەکی درێژ نامێنێتەوە، بۆیە تا ئێستا هیچ پاشماوەیەکی کەلوپەلی دار نەماوەتەوە، بەڵام لە وێنەی مۆرەکاندا، لە کەلوپەلی ناوماڵو تەختی پاشایان دەردەکەوێت[٥٩٣]. جگە لەوەی، کە لە چوارچێوەی گرێبەستەکانی نوزیدا، پیشەی دارتاشی بەدی دەکرێت، کە بەهۆی گرێبەستەوە لە کۆشك کاریان کردووەو زاراوەی (namgru) بەکارهاتووە[٥٩٤]، دیارە دارتاشەکان شتی تریان دروست کردووە وەك (پێپلیکان)و (دەرگا)و (کانتۆر)ی کۆکردنەوەی کەلوپەلی ناوماڵ[٥٩٥].

* باسی سێیەم:

بازرگانی:

مێژووی سەرهەڵدانی چالاکی بازرگانی کۆنەو بۆ چاخەکانی پێش مێژوو دەگەڕێتەوە، لەڕێگای پشکنینە شوێنەوارییەکانەوە توانراوە بازرگانی لە چاخی بەردینی نوێدا ڕوونبکرێتەوە، بەپێی ئەو دۆزینەوانە لەچەند ناوچەیەکی وەك چەرموو، تەپە گەورە، بڕێکی زۆر لەکەرەستەو ئامێری بەردینو کانزایی دۆزراونەتەوە، کە لەپاش لێکۆڵینەوە دەرکەوتووە لەبنەڕەتدا ئەو کەرەستانە لەو ناوچانەدا نین، بەڵکو لەڕێگای بازرگانی نێوان ئەم پێگانە لەگەڵ چەندین ناوچەی وەك (تەپە سیالیك)[٥٩٦] لەباکووری خۆرئاوای ئێرانو ئەرمینیا بەدەست هاتوون[٥٩٧]. لەچەندین ئاوایی لە سوریاو فەلەستین بەهەمان شێوە بەپێی دۆزینەوەکان دەرکەوتووە بەڕێگای پەیوەندی بازرگانییەوە لەگەڵ ناوچەکانی چەرموو و تەپەگەورەو حەسونە



بەدەستیان هێناوە[٥٩٨]. لەچاخەکانی دواتریشدا ئەم پەیوەندییە بازرگانییە بەردەوام بووەو لەرووی چۆنیەتیی و چەندایەتییەوە زیاتر پەرەی سەندووە، ئەوەش بووەتە هۆی بڵاوبوونەوەی شارستانییەتەکان، وەك سواڵەتی حەلەف و دواتر عوبێد[٥٩٩] لەناوچە جۆراوجۆرەکانی خۆرهەڵاتی نزیکدا[٦٠٠].

ناوچەی کەرکوك بە پێی هەڵکەوتە جوگرافییەکەی لەنێوان چەندین مەڵبەندی شارستانییەتی (پیشەسازی، بازرگانی) جیاجیای وەك وڵاتی (بابل) لەباشوورەوە، وڵاتی ئاشوورو سوریا لەباکووری خۆرئاواوە بەتایبەت ئێبلاو ئەنادۆڵ، کەپەدۆکیا لەباکوورەوە، لەلایەکی تریشەوە مەڵبەندەکانی کەرەستەی خاو، وەك کانزاو دار لەخۆرهەڵاتی زاگرۆس و ئەرمینیادا لەدەقەکانی هەزارەی سێیەمی پێش زاییندا دەرکەوتووە کەپەیوەندی بازرگانی لەگەڵ ناوچەی ئەنادۆڵدا هەبووە. هەروەها لەگەڵ ناوچەکانی ئێبلا لە سوریا و[٦٠١] لەگەڵ ئاشووردا[٦٠٢].

لەپاشماوەکانی نوزیدا، کەزۆربەی هەرەزۆری بۆ ناوەراستی هەزارەی دووەمی پێش زاییندا دەگەڕێتەوە، تا ئێستا بایەخێکی زۆر بەدەقە بازرگانییەکانی نەدراوەو ژمارەیەکی کەم توێژینەوەی لەسەر کراوە، بۆیە زیاتر پشت بە لێکدانەوەی هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافی و نرخی کاڵا لەنوزی لەلایەك و ناوچەکانی تری هەمان سەردەم لەلایەکی ترەوە دەبەستین.

*** یەکەم: بازرگانی:**

**أ. بازرگانی ناوەکی:**

نوزی ناوەندی شانشینی ئەراپخا بووە، شارەکانی تری شانشینەکە تا رادەیەکی زۆر پەیوەست بوون بەم ناوەندەوە، کە کۆشك و باڵاترین دەسەڵاتی کارگێری و ئابووری بووەو کاروباری شارەکانی تری هەڵسوڕاندوە، بازرگانانی شارەکانی تریش لە ژێر دەسەڵاتی نوزیدا بوون. وەك لە دەقەکاندا هاتووە، بەروبوومی گوندەکان لەکۆشك لە (نوزی) بەدەست دەگەیەنران و[٦٠٣] لەدەقەکاندا چەندین بازرگانی شارەکانی تر، وەك بازرگانی شاری زێزا، کینکیوی، سەر بە کۆشك بوون[٦٠٤]. بۆیە ئەوەی کە سەبارەت بە (نوزی) بوترێت هەموو (ئەراپخا) دەگرێتەوە، چونکە جگە لەوەی کە ئەو ناوچانە هاوچاخی یەکتر بوون، سەربەیەك دەوڵەتی خوری بوون، کە ئەراپخا بووە.

بازرگانیی ناوخۆ زیاتر پەیوەستە بە دانیشتووان، ئەمەش بەگشتی کەلوپەلی رۆژانە دەگرتەوە، ئەوەش پێویستی بەتۆمارکردن نەبووەو هەر بەشێوازی زارەکی ئەنجام دراوە، بۆیە دەقەکان شتیان لەو بارەیەوە نەخستووەتەروو[٦٠٥]. ئاساییە کە ئەو کەلوپەل و پێداویستییە رۆژانەییانە بریتی بووبێت لەخۆراك وەك، دانەوێڵە، گۆشت، میوە، هەروەها فرۆشتنی کۆیلە، پاشهێنانی لەدەرەوە[٦٠٦]، کەلوپەلی تری وەك جلوبەرگ، کەلەلایەن کارگە تایبەتییەکانەوە دەفرۆشران، چونکە هەندێك پیشەگەر هەبوون، وەك کەرتی تایبەت، کاری رستن و چنینیان لەماڵاندا ئەنجام دەداو مەبەستیش فرۆشتنی بووە[٦٠٧]. ئەوەی کە زیاتر لەناوخۆدا بایەخی پێدراوە (زەوی و زار)ە، کە لەچوارچێوەی ئاڵوگۆرکردنی زەوی لەگەڵ کاڵاکانی تردا باسکراوە.

*** زەوی و زار:**

سەرەرای ئەوەی کە لە نوزیدا زەوی و زار، بەتایبەت کێڵگەکان، بایەخێکی زۆری لەلایەن چینە باڵاکان و دەوڵەتەوە پێدراوە، لەکۆی دەقەکانی نوزیدا هیچ گرێبەستێکی کڕین و فرۆشتنی زەوی و زار نەدۆزراوەتەوە، چونکە زەوی و زار لە نوزیدا کڕین و فرۆشتنی لەسەر نەبووە[٦٠٨]. بۆیە دانیشتووانی شارەکە، یان فەرمانرەوایانی (نوزی) و ئەراپخا رێگایەکیان دۆزییەوە کەبەهۆیەوە دەیانتوانی خاوەندارێتی زەوی بگوێزنەوە، ئەو جۆرە ئاڵ وگۆرە لەدەقەکانی نوزیدا بە (maruti)[٦٠٩] ناسراوە، بەپێی ئەم جۆرە گرێبەستانە، کریار هەڵدەستێت بە (تبنی)[٦١٠] کردنی کەسێك، کەخاوەنی زەوی، یان کێڵگەیە، وەك کوری خۆی، بەوپێیە دەبێتە میراتگری[٦١١] (Zittu)، لە بەرامبەر وەرگرتنی زەویی کەسی (تبنی کراو) دا، برێك دیاری (gištu)[٦١٢]، کە زۆرجار لەشێوەی کانزا، دانەوێڵە، یان ئاژەڵ دەبێت، بەپێی رێکەوتن. (تێخیپ – تیللا – Tiĥep - Tilla) گەورە لێپرسراوی کارگێری لە (نوزی) نموونەیەکی دیاری ئەم جۆرە (تەبەنییە) و داهێنەری ئەم شێوازە بووە، سەدان کەسی (تبنی) کردووە، تا لەرێگای (میراتگری)یەوە زەوییەکانیان وەبەربهێنێت، چونکە دەبێتە بەشێك لەو خێزانە[٦١٣]. (تێخیپ – تیللا) سەدان دەقی لەو بارەیەوە تۆمار کردووە، کە بۆ نەوەی[٦١٤] دووەمی (نوزی) دەگەرێتەوە[٦١٥].

بەهەمان شێوازی (maruti) جۆرێك لە گرێبەستی (التبنی) هەن، کە بە (Aĥĥutu) ناسراون، تیایدا لە جیاتی (تبنی) کردن وەك کور، لێرەدا وەك (برا)ی یەکتر (تبنی) دەکەن[٦١٦].

لە حاڵەتی تردا بەپێی گرێبەستێکی ئاڵوگۆرکردن، دوولایەن بە ئاڵوگۆرکردنی پارچەیەك زەوی هەڵدەستن، واتە هەر لایەنێك پارچەیەك زەوی دەدات بەوی ترو مەرج بۆ حاڵەتی پەشیمانبوونەوە دیاری دەکەن، وەك سزایەك پێویستە سەرپێچیکەر سزاکەی بدات[٦١٧]. تەنانەت مامەڵەی لەو جۆرە لەنێوان (تێخیپ – تیللا) لە (نوزی) لەگەڵ خاوەنی زەوییەکی شاری (کەرانە)[٦١٨] ئەنجام دراوە[٦١٩]. (الراوی – Al - Rawi)[٦٢٠] ئەم جۆرە ئاڵوگۆرکردنە دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو هەوڵانەی، کە لە چوارچێوەی بەهێزکردنی خاوەندارێتی زەوی و زاردا ئەنجام دراوە.

*** کرێ:**

لە دەقەکانی نوزیدا جۆرێکی تر لە (گرێبەست) هەیە کە ناونیشانی (Tupi - titnntu)ە، بەپێی ئەم جۆرە (گرێبەستە). کە لەنێوان دوو کەسدا دەبەسترێت، لایەنی یەکەم برێك لە خشڵ لەلایەنی دووەم وەردەگرێت لەبەرامبەر پارچەیەك زەوی کە دەیخاتە بەردەستی لایەنی دووەم[٦٢١]. یان لەجیاتی زەوی، مرۆڤ بەکارهاتووە، بەتایبەت ئەوانەی

خاوەن بەهرەن. (گاد – Gadd) [٦٢٢] ئەم جۆرە مامەڵەیە بەجۆرێك لە قەرز دادەنێت، کە هەرلایەك شتەکەی خۆی وەك قەرز دەدات بەوی تر. بەڵام ڕای تر هەیە، وەرگرتنی برە خشڵ یان هەر کەلوپەلێکی تری وەك قەرز لە قەڵەم دەدەن، لەبەرامبەردا پارچەیەك زەوی وەك گرەنتی (ضمانة) بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەکە وەردەگرێت. جاری وا هەبووە کە دانەوەی قەرزەکە گۆڕاوە بۆ بارێکی تر، کاتێك کە کەسێك (٣) (ئیمەر – imer) [٦٢٣] جۆ لە میرێکی (نوزی) قەرز کردووە، دواتر بەهۆی دواخستنی قەرزەکەوە، یان نەیتوانیووە بیداتەوە، (گرێبەست)ەکەی گۆڕیوە، بەوپێیە لەبەرامبەردا کوڕێکی خۆی دەنێرێت لەلای خاوەن قەرزەکە کاربکات. لە جیاتی ئەو (سوو – فائدە)یەی کەدێتە سەر قەرزەکە[٦٢٤]. لەلایەکی ترەوە (الراوی) [٦٢٥] پێی وایە زۆر جار مامەڵەکانی (Titennutu) بۆ بەکرێدانی زەوی، یان کەلوپەل بەڵگەن.

بە گشتی کرێ لە نوزیدا بەشێوازی جۆراو جۆر دەدرا، بەڵام زیاتر دانەوێڵە (جۆ یان گەنم) بە کرێکار، وەك کرێی ڕۆژانە دەدرا، جاری واش هەبووە، بەپێی گرێبەستێك ئەنجام دەدرا، کە مانگانە، یان ساڵانە دەبوو[٦٢٦].

*** قەرزی بازرگانی بە (سوو - فائدة):**

گرنگترین ئامانجی بازرگانی بریتییە لە قازانج، بۆیە زۆرجار کۆشك، یان بازرگانی سەربەخۆ لەجیاتی بازرگانی کردن قەرزیان دەدایە کەسانێك بەمەبەستی قازانجو بازرگان بەلایەوە گرنگ نەبوو کەئەو برە پارەیە بۆ چی بەکاردێت، بەڵکو گرنگ ئەوە بووە، کەڕێژەی ئەو (سوو)ەی دەستنیشاندەکرد، کە دەبوایە بدرێت. دەقی (:SMN ١٤٣٥) نموونەیەکی ئەم جۆرەیە: "کوش – کیپا (kuš - kipa) کوڕی (کوشی – kūšše) تالنت[٦٢٧] (مس)ی لە (بیراش – شورا – Biryaš - šura) کوڕی (تیللا) وەرگرت بۆسەرکێشی بازرگانی (a - naˇ - KASKAL(ni). لەمانگی (Šabuta)ی داهاتوودا کوش – کیپا (٢) تالنتو (٣٠) مین مس دەدات بە بیراش – شورا وەك (si - ib - ti) (قازانج – سوو). بڕی (٥) تالنت مس قەرزارە. ئەگەر (بیراش – شورا) داوای بکاتەوە، (کوش – کیپا) دەیداتەوە. (...شایەتەکان). وەك تێبینی دەکرێت کە ڕێژەی زیادەکەی (٥٠٪)یە، ئەم ڕێژەیە لە نوزیدا باو بووە. لەدەقی (SMN: ٣٤٩٦)دا لەکۆتایی گرێبەستەکەدا هاتووە: "ئەگەر ماوەیەکی زیاتری خایاند، (مس)ەکە (قازانج –سوو)ی زیاتری دێتە سەر"[٦٢٨].

جۆرێکی تر لە سوو هەبووە، لەو دەقانەدا بەدیدەکرێت کە زاراوەی (Tamkarašši) لەجیاتی (si - ib - ti) کە پێشتر ڕوویدا، بەکاردەهێنن: "تیهیا کوڕی کوسیبا، کچە کۆیلەیەکی لوللویی لە شاری زیزا برد کە هی (ئار – تورا) کوڕی کیزیری بوو، دوای مانگێك ئەگەر (تیهیا) نرخەکەی نەدات، پێویستە (٥) بەرخو ئاژەڵێك (گا) یان (گوێدرێژ) بژاردەی (٤) ساڵیو پارچەیەك زیوو بدات بە (ئار – تورا) کە نرخی هەمووی (٢٠) شیکلە زیووە، ئەگەر دواکەوت، قازانج یان سوو لەسەری کەڵەکە دەبێت". ئەمەش جیاوازە لەگەڵ (Nemelu)، کە ئەو قازانجەی لە ئەنجامی کڕینو فرۆشتندا پەیدا بووە، ئەژمار دەکرێت، بۆیە زیاتر لە (Sibˇti) یەوە نزیکە، چونکە بەپێی بڕی سەرمایە (سوو) دەخاتەسەر پارەکە[٦٢٩].



**ب. بازرگانیی دەرەکی:**
**- کاڵا بازرگانییەکان:**

**أ. هەناردە:**
**- کۆیلە:**

نوزی هەڵکەوتەیەکی گرنگی لەنێوان بازارەکان و کانگای کەرەستەی خاوەکاندا هەبووە، لەبەر ئەوە توانیویەتی رۆڵێکی گرنگ لەبواری بازرگانیدا ببینێت. لە دەقەکاندا بەتایبەت بایەخ بە بازرگانیی کۆیلە[٦٣٠] دراوە، چونکە کۆیلە گرنگییەکی زۆری بۆ ناوخۆی (نوزی) هەبووە، هەروەها بۆ ناردنی بۆ وڵاتانی وەك ئاشوورو (بابل) کە داوای زۆری لەسەر بووە[٦٣١].

بازرگانی کۆیلە بۆ سەردەمێکی کۆنتر دەگەڕێتەوە، لە وڵاتانی بابلدا سەرچاوەی جەنگیو ناوخۆییەکان پێداویستی پیشەسازیو کێڵگەکانی پڕنەدەکردەوە، بۆیە پشتی بەسەرچاوەی دەرەکی دەبەست، ئەوەتا لە یاساکەی حەمورابیدا، بەندی تایبەت بەو مەسەلەیە دانراوە[٦٣٢]. جگەلەوەش جوانی پێست و بەهێزی لەشی کۆیلەی ناوچەی سوبارتو[٦٣٣]، هۆیەکیتر بووە، کە ئەو داوایە زیاتر بکات، هەر لە کۆنەوە ووشەی کۆیلە لەگەڵ ووشەی (شاخ)دا بەیەکەوە دەهات، چونکە وڵاتە شاخاوییەکان بۆ هێنانی کۆیلە سەرچاوەی سەرەکی بوون. ووشەی لوللو زۆر جار واتای بە هێزیو لەش ساغی گەیاندووە، وەك: (کۆیلە لەش ساغەکانی لوللو)[٦٣٤]، بەهۆی جوانی بەژن و باڵای ژنە (لوللو) یەکانەوە، زۆرجار بەمەبەستی ڕابواردن، یان وەك خێزان خواستی لەسەر بووە[٦٣٥].

بازرگانانی (نوزی) کۆیلەکانیان بۆ بازارەکانی (نوزی) دەهێنا و بازرگانانی وڵاتانی بابل و ئاشوور لەنوزیو ئەراپخا و دەورووبەری دەیانکڕیەوە. لەم بوارەدا گرێبەستێکی بازرگانی لە شاری سیپاردا[٦٣٦] جێگەی سەرنجە، کە بەپێی ئەو گرێبەستە بازرگانێك وەکیلێك ڕادەسپێرێت لەناوچەی (ئەراپخا)، بە پێی (خەسڵەت)ی تایبەت کۆیلەی بۆ بکڕێت. وەکیلە بازرگانییەکەش لە نامەیەکدا بۆ بازرگانەکەی خۆی نووسیوە، کە لە ڕێگا تووشی گیروگرفت هاتووەو نەخۆش کەوتووە، ژنە کۆیلەیەکی کڕیووەو مردووە، بەڵام دانەیەکی تری جوان هەیە[٦٣٧].

وڵاتی (ئیشنونا) لە باشووری خۆرهەڵاتی ئەراپخاوە، ناوەندێکی بازرگانی دیکەی کۆیلە بووە، بەهەمان شێوە کۆیلەی (سوباری)یان دەکڕیو هەندێ جار بۆ (بابل)یان دەنارد، یان بازرگانانی وڵاتی (بابل) لە ئیشنونا کۆیلەیان دەکڕی. بازرگانان لە ئیشنوناوە دەچوون لە بازارەکانی ناوچەی (ئەراپخا) دەیان کڕی[٦٣٨]. دەقێکی بازرگانی باس لەگەشتێکی بازرگانی بۆ سوبارتو بۆ کڕینی کۆیلە دەکات[٦٣٩]. (ڤیلهێلم)[٦٤٠]، پێی وایە کە بازرگانانی ئیشنونا و (بابل) لە شارەکانی دەورووبەری ئەراپخادا کۆیلەیان دەکڕی، چونکە شارەکانی (لوبدی – Lubdi)، (ئاشوخ – Āšuḫ) لە باشووری ئەراپخادا دووناوەندی تری بازرگانی کۆیلە بوون، جگە لەنوزی. هەروەها بازرگانانی (لارسا)[٦٤١]، بۆ کڕینی کۆیلە، گەشتی بازرگانییان بۆ شارەکانی (زابان)و (شیمورم) و (ئەراپخا) ئەنجامداوە[٦٤٢].

*** کانزاکان:**

کانزاکان بەگشتی کاڵایەکی بازرگانیی گرنگی کۆن بوون، چونکە لەهەموو بوارێکدا پێویست بووە، هەر لەدروستکردنی کەلوپەلی ناوماڵ و ئامێری کشتوکاڵی و پێچکەی عەرەبانە، تا کارووباری سەربازی بۆ دروستکردنی شمشێر، خەنجەر، ڕمو کومەو قەڵغانی سەربازان بەکاردەهات. لەلایەکی تریشەوە جیاوازی لە دابەشبوونی کانەکانی کانزا لەنێوان ناوچە شارستانییەتەکاندا فاکتەرێکی گرنگ بووە، وڵاتی (بابل) هیچ جۆرە کانزایەکی وەك زیوو، مس، تەنەکە، بەردی بەنرخی نەبووە، لە کاتێکدا ئەم کەرەستانە لەناوچەکانی باکووری خۆرئاوای ئێران و ئەرمینیا و ئەنادۆڵ زۆر هەبوون، بۆیە لە ڕێگای بازرگانییەوە بۆ پیشەسازی ناوخۆ دەیانهێنا. بەتایبەت بۆ ئەو ناوچانەی کەهێزی سەربازی پێیان نەدەگەیشت[٦٤٣].

زۆربەی کانزاکان، ئەگەر هەمووی نەبێت، لەناوچەی نوزیدا نەبووە، بەڵکو لە وڵاتانی ترەوە دەهێنران، وەك تەنەکەو مس لە خۆرهەڵاتی زاگرۆس، لە ڕێگای وڵاتی (لوللو)و (شمشارە)و (بتوێن)ەوە دەگەیشتە (نوزی)، کەوەك ناوەندێکی بازرگانیو بازاڕێك بۆ ئاشوورو (بابل) وا بووە[٦٤٤]. (نوزی) وەك ناوچەیەکی ترانزێت بووە ئەو کانزایانەی پێدا تێدەپەڕی، ڕێی تێدەچێت ئەوەش هۆی ئەوە بوو بێت کەتا ئێستا دەقی بازرگانی لەوجۆرە لەبەردەستدا نییە، بەڵام سەبارەت بە (مس)، (یانکوفسکا)[٦٤٥] پێی وایە کەلەهەزارەی یەکەمدا (ئەراپخا) (کان)ی مسی خۆی هەبووەو ئاشوورییەکان سوودیان لێوەرگرتووە. لە هەزارەی سێیەمی پێش زاینییدا ئەکەدییەکان و دواتر گودیا میری لەگەش، (مس) یان لە کیماش لە باشووری کەرکوك دەرهێناوە[٦٤٦]. ئەمە ڕێی تێدەچێت، چونکە هاوکات لەگەڵ هەڵکەوتەی (نوزی) لەسەر ڕێگای بازرگانی (تەنەکە)و (مس) لەخۆرهەڵاتەوە، هەرزانی نرخی ئەم کانزایانە لە (نوزی) بەرامبەر شارەکانی تر، وەك: بابل، ئاشوور.. هتد[٦٤٧]، بوونەتە هۆی ئەوەی کەئەو وڵاتانە لە نوزییەوە ئەم کانزایانەیان دەست کەوتبێت، بەڵام (ئەلحلو)[٦٤٨] پێی وایە دەوڵەتی میتانی لەهەموو ناوچەکانی ژێرسایەی خۆیدا تەنها گومرگی خستووەتە سەر کاڵاکان و ڕێگای لەبازرگانی نەگرتووە. ئەوەش لەناوچەکانی میتانیدا، بووەتە هۆی گەشەکردنی ئەو جۆرە بازرگانییە[٦٤٩].

*** کاڵا پیشەسازییەکان:**

پیشەگەری بەگشتی لە (نوزی)دا فراوان و پێشکەوتوو بووە، لەئەرشیفی کارگێڕیو دابەشکردنی خۆراك و کرێدا، ئاماژە بەگەرەکی[٦٥٠] ئاسنگەران، نووسەران، تەونکەران، کراوە[٦٥١]. کاڵا دروستکراوەکان بەمەبەستی بازرگانی دروست دەکران، بەتایبەت بەرهەمەکانی ڕستن و چنین، دەقەکانی (نوزی) لەو ڕوانگەیەوە تیشك دەخەنە سەر

کارگەکان کەسەر بەکۆشك، یان کەسی تایبەتی لە مالأندا بوون[٦٥٢].

لە بواری بازرگانیدا کالأی قوماش و جلوبەرگ نێردراوەتە دەرەوە، لەبەرامبەردا کەرەستەی خاویان پێ دەکری، وەك بۆیاغ. بازرگانێکی (نوزی) گرێبەستێکی بەوەرگرتنی جلوبەرگ و قوماش تۆمارکردووەو بۆ فینیقیا (سوریا) بردوویەتی تا لەبەرامبەردا بۆیاخی شین و خوری پێ بهێنێت[٦٥٣].

لە دەقێکی تردا، بازرگانێك بەناوی (خاشیپ - تیللا) پارچەیەك قوماش لە (ور - تشوپ) وەردەگرێت و پاش گەڕانەوەی لەگەشتی بازرگانی لەگەڵ کاروانەکەیدا، پارەکەی دەدات[٦٥٤]. هەر چەندە ناوی ولأت و شوێنی فرۆشتنی قوماشەکە نەبراوە، بەلأم لە دەستەواژەی "... کاروانی بازرگانی..، .. بە مەبەستی قازانجی بازرگانی.."، دەردەکەوێت، کە مەبەست لەو مامەلەیە بازرگانی دەرەکی بووە.

لە دەقێکی تردا بازرگانێك بەناوی (کازی) (٩) پارچە جلوبەرگ لە (تارمی - تیللا) بەکەفالەتی (نانیا) وەردەگرێت، تا ئەسپێکی بۆ بهێنێت، وەك ئەسپەکەی پاشا ڕاهێنراو بێت، بەو مەرجەی لە مانگی (Seĥalu)دا کارەکەی ئەنجام بدات[٦٥٥]. دیاری کردنی بڕێکی زۆر جلوبەرگ و هێنانی ئەسپێکی ڕاهێنراو، بەلگەیە بۆ هێنان لەدەرەوەی (نوزی)، چونکە ئەسپ لەو ناوچەیەدا کەم بووەو نرخی گران بووە، کەواتە ئەمەش بەمەبەستی بازرگانی دەرەکی بووە.

کالأیەکی تری بازرگانی گرنگ ئەویش سوالەتە (الفخار)، لەچاخە کۆنەکاندا بایەخێکی زۆری بۆ کەلوپەلی ناومالٚ هەبووە، وەك قاپ و گۆزەو جوانکاری، جگە لە دروستکردنی بەرهەمە هونەرییەکان، وەك پەیکەرو خشتی نووسین، کە لە قوڕێکی نەرم دروست دەکراو لەناو کورەی تایبەت سوور دەکرایەوە. هەر سەردەمێك جۆرێك سوالەتی تایبەتی خۆی هەبووە، لە هەزارەی دووەمی پێش زاییندا جۆرێك لە سوالەتی هونەری لە (ئەراپخا)و خۆرهەلأتی (ئەنادۆڵ) و (ئالالاخ)و (ئۆگاریت) لە سوریاو هەروەها لە عەگەرگوف پایتەختی کاشی بلأوببوونەوە، کە بە هۆی پشکنینەکانەوە ئاشکرا بووە لە یەك چاخدا بووە لەنێوان (١٧٠٠ - ١٤٠٠)ی پێش زاییندا، لەلای زانایان بە سوالەتی (نوزی) ناسراوە، چونکە یەکەم جار لەم شوێنەدا دۆزرایەوە[٦٥٦]. سەرەڕای ئەوەی کە نەزانراوە، لە چ ناوچەیەك لەو ناوچانەی سەرەوەدا سەری هەلداوەو بلأوبووەتەوە، یان نێردراوەتە دەرەوە، بەلأم بلأوبوونەوەی جۆرێك لە سوالەت لەناوچەی جۆراوجۆر لەیەك کاتدا هەر بەهۆی بازرگانییەوە بووە. (ساگز)[٦٥٧] ئەو جۆرە بلأوبونەوەیە لەنێوان ئەو شارانە بۆ پەیوەندی بازرگانی دەگێڕێتەوە، بۆنموونە بازرگانیی نێوان (نوزی)و (ئالالاخ) لە سەدەکانی پانزەو چواردەی پێش زاییندا.

لەچەندین شوێنەواری ئاوایی لە ولأتی شارەزوور (لوللو) دا هەمان سوالەت بەهەموو جۆرەکانی (قاپ، گۆزە، تاس) دۆزراونەتەوە، کە هاوشێوەکەیان تەنها لە نوزیدا هەبووە، وەك نزیکترین شوێن لێیانەوە[٦٥٨]. لەکاتێکدا پەیوەندی بازرگانی نێوان (نوزی)و ولأتی (لوللو) ناسراوە[٦٥٩]. بۆیە بە لەبەرچاوگرتنی شانشینی (ئەراپخا)، وەك ناوەندێکی خوری و بوونی کارگەی تایبەت بەدروستکردنی سوالەت[٦٦٠] تەنانەت گەرەکێك، یان شوێنێك لە نوزیدا بە ناوی (alu paĥĥarašwe) واتە گەڕەکی دروستکەرانی سوالەت[٦٦١]، پێدەچێت لە نوزییەوە بۆ ئەو ناوچانە نێردرابێت، بەتایبەت ئەوانی دەورووبەر.

بەرهەمێکی تری ناوخۆی (نوزی) بریتییە لە ڕۆن، کە خۆراکێکی ڕۆژانە بووە، سەرچاوەکانی جۆراوجۆرن، لەچاخە کۆنەکاندا بەروبوومی ئاژەڵی بەکارهاتووە کە پێدەچێت سەرچاوەیەکی سەرەکی ڕۆن بووبێت، هەروەها لەدەقەکانی (نوزی)دا کونجی سەرچاوەیەکی تری ڕۆن بووە[٦٦٢]. سەرەڕای ئەوەی کە دەقێکی بازرگانی دەربارەی ڕۆن بۆ ناردنە دەرەوە لەبەردەستدا نییە، بەلأم لەبۆنە ئاینییەکان و بۆ دروستکردنی دەرمان ڕۆنی کونجی بەکارهێنراوەو بەهۆی گرانی نرخەکەی زیاتر بنەمالەی خانەدان و پاشایان لە (ئەراپخا)دا بەکاریان هێناوە[٦٦٣]. پێوانەی تایبەت بەشلەمەنی بۆ پێوانی ڕۆنی شل بەکارهاتووە وەك (qūm talu)و لە ولأتی (بابل) بەگشتی چووەتە بواری بازرگانییەوە[٦٦٤]. بەلأم لە نوزیدا ئاماژەی بارکردنی ڕۆن و بەزی بەراز لە گاسوور (نوزی) یەوە بۆ شارەکانی لێواری دیجلەو (ئەکەد) لە کۆتاییەکانی هەزارەی سێیەمی پێش زاییندا هەیە[٦٦٥].



**ب. هاوردە:**

دابەشبوونی نارێکی کەرەستە خاوەکان بووەتە هۆی ئەوەی کە وڵاتان لە کۆنەوە پەنا بۆ بەرهەمهێنانی کەرەستەو کەلوپەلی پێویست بۆ پڕکردنەوەی پێداویستی پیشەسازیو کاروباری ڕۆژانە ببەن، بۆیە چەندین کەرەستە هەبووە، کە لە (نوزی)و دەوروبەریدا نەبوون وەك کانزاو کەرەستەی خاوی تر وەك بۆیاخ، تەنانەت کۆیلە کەوەك ئامێرێك لەکارگەو کێڵگە کشتوکاڵییەکاندا بەکارهێنراوە.

**١.کۆیلە:**

ناوچەکانی (ئەراپخا) بەگشتیو (نوزی) بەتایبەتی پشتی بە ئابووری کشتوکاڵیو پیشەگەری دەبەست، ئەوەش پێویستی بەدەستی کار هەبووە، تەنها بەدەستی کاری ناوخۆیی پڕنەبۆتەوە، بۆیە پەنایان بۆ بەکارهێنانی کۆیلە بردووە، کە بەتایبەتی لە وڵاتی (لوللو – نوللو) لە خۆرهەڵاتدا دەیانهێنان[٦٦٦].

ئەرشیفەکانی (نوزی) بەو جۆرە گرێبەستانە دەوڵەمەندن، کە بەهۆیەوە ئەم بازرگانییە ئەنجام دراوە. وەك لە گرێبەستێکدا هاتووە، کە: (ئەرشاوا کوری ئەبیل ئاموری) بەڵێن بە (ئیخلی – تیشوپ – Iĥli - Teššup) دەدات: "(٦٠) شیکل زیووم لە (ئیخلی – تیشوب کوری تایا) وەرگرت، کە نرخی کرینی کچە کۆیلەیەکی (نوللو)ییە، (ئەرشاوا – Ăr - šawa) بەپێی سیفەتی دیاریکراو کچە کۆیلەیەکی (نوللو) لە مانگی (Hutalše) بە (ئیخلی – تیشوپ) دەدات، ئەگەر لەرۆژی دیاریکراودا نەیهێنا، پێویستە بۆهەر ڕۆژێك دواکەوتن (١) مین مس بە (ئیخلی – تیشوپ) بدات. (ئیشا – خالو) کەفیلی (ئەرشاوا)یە"[٦٦٧].

لە هەندێ حاڵەتدا جێبەجێکردنی مامەڵەکەش تۆمار کراوە، بەمەبەستی لە ئەستۆ لابردنی پەیمان نامەکە لەسەر بریکار (تامکارو)، چونکە ئەو برە پارە (نرخ)ەی کەوەری گرتووە تا هێنانی کاڵاکە لە ئەستۆی دابووە. هەمان بازرگان لەگەشتەکەیدا سەرکەوتوو بووەو دوای گەرانەوەی بەمجۆرە کۆتایی بەمامەڵەکە هێناوە: "من کچە کۆیلەیەك قەرزاری (ئیخلی – تیشوپ) بووم، ئێستا کچە کۆیلەیەکی (نوللو)ییم بە (ئیخلی تیشوپ)دا.. شایەتەکان". بەپێی یاسا دوای تەواو بوونی مامەڵەکەش، هەر کات داواکارێك سەرهەڵبدات بەخاوەندارێتی کۆیلەکە، بێویستە لەسەر بازرگان (وەکیل) قەرەبووی بکاتەوە[٦٦٨]. هەروەها بە هۆی بوونی کەفیل، یان مسۆگەرکردنی بە هۆی لایەنی سێیەمەوە، ئەم جۆرە بازرگانییە لەلایەن کەسێکی (بازرگان) سەربەخۆ (تمویل) کراوە، چونکە لە مامەڵەی بازرگانی (کۆشك) دا، پێویست بە کەسی سێیەم، یان کەفیل نەبووە، چونکە وکیل (تامکارو) لەبنەرەتدا کارمەندێکی تایبەتمەندی کۆشك بووە، لە بەرامبەردا کرێ لەشێوەی کەلوپەل، یان دانەوێڵە وەردەگرێت[٦٦٩]. سەبارەت بە وڵاتانی تر، کە بازرگانانی (نوزی)، کۆیلەیان لێوە دەهێنا، وڵاتی (خانیگەڵبات)ی[٦٧٠] (میتانی) بە پلە دوو دێت، تا دەوڵەتش ئەوەی، کە لە بەردەستدا بێت، یەك ئاماژە بۆ هێنانی کۆیلە لە وڵاتی کاشییەوە هەیە، کە ئەویش هێنانی کچە کۆیلەیەکە لە بنەرەتدا خەڵکی (ئەراپخا) بووە[٦٧١].

**٢. کانزاکان:**

**أ. زێر:**

سەرەرای ئەوەی زێر لەچاخە کۆنەکاندا، بەتایبەت لە چاخی بنەماڵەی سێیەمی ئورو بابلی کۆندا وەك کەلوپەلێکی گرانبەها ناوبراوە، بەڵام وەك کانزاکانی تر، تا هەزارەی یەکەم بەکارنەهاتووە. ئەویش بەهۆی دووری، یان نەدۆزینەوەی (کان)ی زێر.

سەبارەت بە زێر لە نوزیدا[٦٧٢] لەسەرەتاوە ئاماژە بۆ بوونی نەکراوە، بەڵام (لاخمان – Lachman) سەلماندی، کە لە مامەڵەی قەرز (titenntu)دا بەکارهاتووەو[٦٧٣] بۆ سزادانی وەکیلی بازرگان لە دواکەوتنی هێنانی کەلوپەلدا بەکارهاتووە[٦٧٤]. هەروەها زۆر جار لە مامەڵەی (Maruti)دا بەکارهاتووە، وەك سزایەك بۆ پەشیمان بوونەوەو شکاندنی ئەو پەیمانە لەبارەی فرۆشتنی (تبنی)یەوە، واتە مامەڵەی زەویو زاردا دەسەپێنرا[٦٧٥].

سەرەرای نەبوونی گرێبەست لەبارەی هێنانی زێر لەلایەن بازرگانی (نوزی)، نرخی زێر لە ناوچەکانی (ئۆگاریت)و (میسر)دا زۆر نزمتر بووە لەهەموو ناوچەکانی تری خۆرهەڵاتی نزیکی کۆن وەك، وڵاتی (خیتی)و (نوزی) و (بابل) [٦٧٦]. ڕێی تێدەچێت لە میسرەوە بۆ بەندەری (ئۆگاریت)و دواتر بۆ ناوچەکانی تر، بە تایبەت (نوزی) پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ شارەکانی سوریادا هەبووە، بەتایبەت ئالالاخ[٦٧٧].

(توشراتا) پاشای میتانی، کچێکی خۆیو چەندین دیاری تری بۆ فیرعەونی میسر نارد، لەبەرامبەردا بەقەد باڵای کچەکەی داوای زێری لێکردووە. بەو پێیەی لە ڕێگای دیبلۆماسییەوە شێوەیەك لە ئاڵوگۆر ئەنجام دراوە، ئەم دابو نەریتە لەو چاخانەدا باو بووە[٦٧٨]. (نوزی)ش ناوەندێکی گرنگی دەوڵەتی میتانی بووە، ڕێی تێدەچێت لەڕێگای میتانییەوە بەدەستیان هێنابێت.

**ب. زیوو:**

زیوو کانزایەکی زۆر گرنگو بەنرخ بووە، جگە لەدروستکردنی کەلوپەل، بایەخەکەی لەوەدا بوو کەوەك دراوێك بۆ دیاریکردنی بایی کاڵاکان بەکاردەهاتو نرخەکەی دیاریدەکرا[٦٧٩].

نەزانراوە سەرچاوەکانی هێنانی زیوو بۆ (نوزی) لەکوێوە بووە، چونکە دەقەکان لەو بارەیەوە بەڵگە ناخەنە ڕوو، (لیمانس – Leamans)[٦٨٠] ئیلام بەسەرچاوەی سەرەکی زیوو بۆ وڵاتی (بابل) دادەنێت، ئاشوورییەکان لەسەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زانییدا ئەم کانزایەیان لەناوەندەکانی ئەنادۆڵەوە بۆ ئاشوور دەبرد، بەو پێیە لەو سەرچاوانەوە بەرێگای وڵاتی ئاشوورو (بابل) زیوو گەیشتووەتە (نوزی) و دەوروبەری.




All photos 1: 2, all drawings 2: 5 unless otherwise stated.

**ج. تەنەکە (القصدير):**

بۆ دروستکردنی برۆنز کە لە هەزارەی دووەمی پێش زاییندا بایەخێکی زۆری هەبووە، پێویست بوو (تەنەکە) لەگەڵ (مس)دا تێکەڵ بکرێت، بۆیە بایەخی ئەم کانزایە لەزیادبووندا بوو، چەندین کەلوپەلی وەك کەلوپەلی ناوماڵ و پەیکەرو ئامێری کشتوکاڵی لێ دروستدەکرا[٦٨١]، جگە لەوەی وەك بایی کاڵا بازرگانییەکان بەکارهاتووە[٦٨٢].

لەهەزارەی دووەمی پێش زاییندا بازرگانە ئاشووری و خورییەکان لە ئەنادۆڵدا مامەڵەیان لەسەر دەکرد، لە ئاشوورەوە بۆ ئەنادۆڵ دەگواسترایەوە[٦٨٣]. بەڵام زۆر سەرچاوە هەبووە کەتەنەکەی لێوە دەهێنرا. باکووری خۆرئاوای ئێران بۆ (نوزی) سەرچاوەی سەرەکی تەنەکە بووە، (لیسۆ – LæssØe)[٦٨٤]، کوردستانی باشووری دیاریکردووە، (چەند توێژەرێکی عێراقی)[٦٨٥] تەنها ئاماژەیان بۆ ناوچەکانی باکووری خۆرهەڵات کردووە. بۆیە پێدەچێت خۆرهەڵاتی زاگرۆس (خۆرئاوای ئێران) سەرچاوەیەکی سەرەکی بوبێت، چونکە بڕێکی زۆر تەنەکە لەپاشماوەکانی شمشارەدا دۆزراوەتەوەو بەپێی تۆمارەکانی شمشارە دەوڵەتی ئاشووری لەو ڕێگایەوە بۆ (نوزی)و دواتر بۆ ئاشوور بردوویەتی، بەو پێیە ئەو شوێنانە بازارێکی سەرەکی ئەم کانزایە بوون بۆ وڵاتی ئاشوورو بابل[٦٨٦]، بۆیە نرخی تەنەکە لە نوزیدا لەو وڵاتانە هەرزانتر بووە[٦٨٧].

ڕێگایەکی تریش[٦٨٨] هەبووە، کە لەڕێگایەوە، یان لەکانەکانییەوە تەنەکە گەیشتووەتە (نوزی)، ئەویش ڕێگای وڵاتی (لوللو)ە لە (شارەزوور)ی ئێستا[٦٨٩]. پەیوەندی بازرگانی لەنێوان (نوزی)و وڵاتی (لولوو) زۆر بەهێز بووە، بۆیە ڕێی تێدەچێت کە ئەم بازرگانییەش هەبووبێت.



**د. مس:**

مس لەدروستکردنی (برۆنز)دا کەرەستەیەکی سەرەکییە، جگە لە کەلوپەلی ناوماڵ[٦٩٠]، بۆ دروستکردنی چەك، سەرکڵاوو قەڵغانی سەربازان بەکارهاتووە[٦٩١]، بۆیە پێویست بووەو لەدەرەوە بەدەستیان هێناوە.

سەرچاوەکانی مس لە (نوزی) دوور بوون، بۆیە لەرێگای وڵاتانی ترەوە ئەم کانزایە گەیشتوەتە (نوزی)، وڵاتی (بابل) لە ناوچەکانی (داون – بەحرین)ی ئێستاو ئاشوورییەکان لە ئەنادۆڵەوە بردوویانە[٦٩٢]. بەوپێیە وڵاتانی (ئاشوور) و (بابل) بۆ هێنانی مس سەرچاوەی سەرەکی بوون[٦٩٣]. جگە لەوەش بەهەمان شێوازی هێنانی تەنەکە، لەرێگای وڵاتی لوللو (زاموا)وە مس گەیشتووەتە (نوزی)، بۆیە بەهۆی نرخی مس لە نوزی لەزۆر بواری ئالوگۆڕکردن و سزادان بەتایبەتی لە کاتێکدا کە قەرزار، یان بازرگان بە هۆی دواکەوتنیان لە گێڕانەوەی پارە، سزای زیاتر بەپێی مس دەخرایە سەریان[٦٩٤].

**ه. ئاژەڵ:**

ناوچەکانی (نوزی) لەڕووی ئاژەڵدارییەوە دەوڵەمەندبوو، بۆیە پێویستی بە هێنانی ئاژەڵی وەك مەڕو بزن و گا نەبووە، بەڵام پێدەچێت ئەسپ لە ناوچەکەدا کەم بووبێت، یان نەبووبێت، چونکە پێشتر ئەم سەردەمە بایەخێکی زۆری نەبوو، زیاتر گوێدرێژ بۆ باروکاروانی بازرگانی بەکاردەهات، لە بواری سەربازیشدا بەهۆی نەبوونی پێچکەی کانزایی بەکارنەدەهات، بەڵکو لەدار دروست کرابوون و بەرگەی هێزی ئەسپی نەدەگرت، بەدۆزینەوەی ئەو پیشەسازییە بایەخی ئەسپ زیاتر بوو[٦٩٥]. بۆیە لەناوەراستی هەزاری دووەمی پێش زاییندا بەهۆی بەرزی نرخی (ئەسپ)ەوە، لەتوانای هەموو کەس دانەبوو بەدەستی بهێنێت کە دەگەیشتە (٣٠) شیکل زیوو[٦٩٦].

بە پێی چەندین گرێبەستی بازرگانی، ئەسپ پلەیەکی باڵای هەبووە لەهاوردەکاندا، لەدەقێکی (HSS: ٩ - ٩la)دا (بین – ناسر) نرخی کرینی ئەسپێکی بژاردەی لە (شیلوا – تیشوپ – Šelwa - Teššup) وەرگرت، کەتەمەنی لەنێوان (٤ – ٥) ساڵ دەبێت، کەدوای مانگێك بۆ کۆشك لەشاری (نوزی) بیهێنێت[٦٩٧]. لە گرێبەستێکی تردا، بازرگانێك بەناوی (ئومانی کوری کاوینی –بازرگان)، نرخی کرینی (٦) ئەسپی لە (شیلوا – تیشوپ) وەرگرت و بە دووکاروان هەر جارەی (٣ ئەسپ) دەهێنێت، لەدەقێکی تردا باس لە هێنان و بەدەستگەیاندنی (٢٠) ئەسپ کراوە، کە لە کۆشکدا دابەشکراوە[٦٩٨].

لەو گرێبەستانەدا تێبینی ئەوە دەکرێت، ناوی ئەو وڵاتە نەبراوە، کە پێویستە ئەسپەکانی لێوە بهێنن، وەك دەربارەی کۆیلەکان دەکران، بەڵام بەهۆی گرانی نرخی ئەسپ، پێدەچێت لەدەرەوەی ناوچەکەوە هاتبێت. (یانکوفسکا)[٦٩٩] ناوچەکانی (زاموا) و (شارەزوور) و (گلزان) و (مات – منای –ماننا)[٧٠٠] بەناوچەی سەرەکی بەخێوکردنی ئەسپ دیاری کردووە، چونکە سەرانەی ئەو ناوچانە بۆ دەوڵەتی ئاشوور، ئەسپ بووە، لە دەقەکانی (نوزی) و (کورخاننی)دا باس لە کۆکردنەوەی ئالف دەکات، کە بۆ ئەو ئەسپانەی بۆ چاکردنی (تهجین) ئەسپەکانیان هێنرابوون[٧٠١]. هەروەها ناوچەکانی میتانی (خانیگالبات) بە بەخێوکردن و راهێنانی ئەسپ بەناوبانگ بوون[٧٠٢]، جگە لەوەش هەموو گرێبەستەکان لەنێوان فەرمانرەوایانی شاردا بووەو وەك (شیلوا – تیشوپ) کوری پاشاو پارەکەش لەلایەن کۆشك دابین کراوە، و کەسانی تایبەتی (تامکارو)ی بۆ تەرخانکراوە، بۆیە ئەمانە دەریدەخەن کە لە دەرەوەی وڵات هێنراون.

**و. کەرەستەو کاڵای پیشەسازی:**

جلوبەرگ و قوماش کاڵای بازرگانی کۆنن، سەرەرای ئەوەی پاشماوە شوێنەوارییەکان بەڵگەی مادی لەوبارەیەوە نادەن بەدەستەوە، بەڵام ئەوە بەڵگەی کۆتایی نییە بۆ نەبوونی بازرگانی جلوبەرگ و خوری و شتی لەوبابەتانەی، کە بەهۆی تێپەربوونی کات لەژێر گۆرانکاری کەشوهەوادا لەناو دەچن. بەڵام دەقەکان بەئاماژەکردن بە زاراوەی خوری (TUG)، قوماش.. تاد، بەپێی کێش و پێوانەی دیاریکراو کەلەو سەردەمەدا لەشوێنەکانی تردا کاری پێکراوە[٧٠٣]، نیشانەی بازرگانی پێکردنە.

سەبارەت بەگرێبەست و هێنانی ئەو بابەتانە، هەندێ دەق هەن کەتیشکی باش دەخەنە سەر ئەو جۆرە بازرگانییە، لە دەقێکدا باس لەبازرگانێکی (نوزی) دەکات، کە جلوبەرگی لە نوزییەوە بۆ فینیقیا لە لێوارەکانی دەریای ناوەراست[٧٠٤] بردووە، بەرامبەر هێنانی خوری رەنگاو رەنگی شینی مۆرباو (تاکلتو)[٧٠٥] هەروەها لە مۆرو شوێن مۆرەکانی (نوزی) و کورووخانیدا جلوبەرگی شێوازی سوری تێدایە، کەبەهۆی بازرگانییەوە هێنراوە[٧٠٦].

**ز. دانەوێڵە:**

ناوچەکانی (نوزی) بە گشتی بەچاندن و بەرهەمی دانەوێڵە دەوڵەمەند بوون، ساڵانە برێکی زۆر لە دانەوێڵە لەهەموو کێڵگەکانەوە بۆ کۆشك لە (نوزی) دەبرا. (فینك – Fincke)[٧٠٧]، پێی وایە دوای دابەشکردنی وەك کرێ بەسەر کرێکاران و..تاد، بەشێك لە زیادەکەی لەبواری بازرگانیدا بەکاردەهات، بەڵام لە دەقەکانی کۆتایی چاخی (نوزی)، بەتایبەت لەسەردەمی نەوەی پێنجەمدا باس لەهێنانی جۆ لە وڵاتی لوللو لە خۆرهەڵاتەوە کراوە[٧٠٨]، لەو سەردەمەدا برێکی زۆر لە دانەوێڵە بەکاروان لە نوزییەوە بۆ ناوچە سنوورییەکان دەگوێزرانەوە، پێدەچێت ئەم رووداوە پەیوەست بووبێت بەو بارودۆخە نائاساییەی، کە بە هۆی هێرشەکانی کاشییەوە روویدابێت، کاتێك کەهەندێ لە گوندەکان و کێڵگەکانیان کەوتبوونە دەستی دوژمن، بۆیە پێویستیان بەهێنانی دانەوێڵە بووە لەدەرەوەدا[٧٠٩].

### ک. کاڵاکانی تر:

بەپێی ئەو دەقانەی کەتێیدا کۆشك بەمەبەستی ئاڵوگۆڕپێکردن، کاڵای دەدایە بازرگانەکان، پێویست بوو لە بەرامبەردا ئەو کاڵایانە بهێنن، کە لە ناوخۆدا نەبووە، جگە لەوانەی سەرەوە، لەو دەقانەدا شتی تری وەك بۆن، (عەرعەر)، ڕۆنی داری ئیرزو سەرو[٧١٠] کە سەرچاوەی هێنانیان نەزانراوە، بەڵام وەك زانراوە ناوچەکانی باکووری زێی بچووك و زێی گەورە تا دەوڵەتش ئەو جۆر دارانەی لێیە[٧١١]، پێدەچێت لەو ناوچانەوە هێنرابێت. لەدەقەکانی نوزیدا باس لەگواستنەوەی داری جۆراوجۆر کراوە، وەك عەرەبانە دارەکان (GIŠ - MAR - GID.DA)، کە بە ڕێگای زێی بچووکدا (Ša - ebertan) بە گوێدرێژو گا بۆ (نوزی) گوێزراوەتەوە[٧١٢].

### دووەم: بازارەکان:

بازار لە بواری لەبازرگانیدا بایەخێکی زۆری هەیەو ئامرازێکی سەرەکی مامەڵە بازرگانییەکانە. بە پەرەسەندنی بازار بازرگانیش زیاتر پێش دەکەوێت. بەتێڕوانینی رووکەش وادێتە بەرچاو کەلەچاخە کۆنەکاندا بازار نەبووبێت، چونکە لەدەقەکاندا بەشێوەیەکی روون ناوی بازارەکان نەهاتووە، بۆیە بە رای لەهەندێ لەزانایان لەو سەردەمانەدا بازار نەبووە[٧١٣]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەپاشماوەی شارەکاندا بەگشتی گۆڕەپان لەنێوان گەرەك و کۆشکەکاندا بەدی دەکرێت، کەوەك بازاری وەرزی بەکارهاتوون[٧١٤]، هەروەك چۆن دەوڵەت بەپێی وەرزەکان و دەرکەوتنی هەر بەروبوومێکی وەرزی، کریارو فرۆشیارەکان بۆ ئاڵوگۆڕو فرۆشتن و کرینی بەروبوومەکانیان کۆدەبنەوە.

لە گرێبەستە بازرگانییەکاندا زۆرجار شوێنی نووسینی رێکەوتنامەکە نووسراوە، بەتایبەت لە کۆتایی گرێبەستەکەدا دەستەواژەی "ئەم تابلۆیە لەدەروازەی سەرەکی شاری (نوزی) نوسراوەتەوە"[٧١٥]. بەو پێیەی کە مامەڵەی بازرگانی لە بازارەکاندا ئەنجام دەدرێت، رەنگە مەبەست لەدەروازەی شاری (نوزی)، هەر ئەو بازارەبێت، کە لە لەدەورووبەری شارەکەدا هەبووە[٧١٦].

### سێیەم: دراو یان ئامرازی مامەڵەکردن:

سەرەرای پەرەسەندنی مامەڵە بازرگانییەکان لە چاخە کۆنەکاندا، تا نزیکەی ساڵی (٧٠٠)ی پێش زایین دراوێکی دیاریکراو نەهاتووەتە ئاراوە، کە بۆ یەکەم جار لە وڵاتی (لیدیا)[٧١٧] دراو بۆ کرین و فرۆشتنی کاڵا و پێداویستییەکان بەکارهێنراوەو لەلایەن دەوڵەتەوە بە رەسمی لە وڵاتدا کاری پێدەکرا[٧١٨].

لەو سەردەمانەدا لەجیاتی دراو، کاڵا بازرگانییەکان بەشێوازی ئاڵوگۆڕ بەدەست دەهاتن، دواتر بەهۆی دانەوێڵەوە کاڵاکانیان دەنرخاند، بەتایبەت جۆ، بە هەمان شێوە بۆ دیاریکردنی کرێی کرێکاران[٧١٩]. لەگەڵ پەرەسەندن و فراوانبوونی بازرگانیدا ئامرازەکانی مامەڵە بازرگانییەکانیش



پەرەیان دەسەند، دانەوێڵەش بەهۆی قورس و زۆری برەکەی و هەروەها تێکچوونی دوای ماوەیەك، کانزا وەك پێوەرێکی نرخ پەیدا بوو، بەتایبەت زیوو، بۆ نموونە بۆ کرینی کۆیلەیەك، کەنرخی (٢٠) شیکل بوو، دەبوایە بایی (٢٠) شیکل کاڵای تر بەپێی ویستی فرۆشیار بدات، وەك گا، مەر.. تاد[٧٢٠]. جار بە جار (مس) لە پاڵ زیوودا بەکاردەهات. لە گرێبەستێکدا بازرگانێك کچە کۆیلەیەك لە کۆشك لە (نوزی) دەکرێت، بایییەکەی (٥) تالنت[٧٢١] (مس) بوو، بەڵام پێویستە لەسەر بازرگانەکە بچێت لە گەشتێکی بازرگانیدا بەپێی بایی (٥) تالنت (مس)ەکە (دار، بۆن، بۆیاخ..) بکرێت و لەبەرامبەر کرینی کۆیلەکە بدات بە کۆشك[٧٢٢]. بەوشێوەیە بایی و نرخی کاڵاکان بە پێی کانزایەك دیاریدەکران، پێدەچێ هەر ئەم سیستەمە بووبێتە هۆی داهێنانی دراوێکی رەسمی[٧٢٣].

### چوارەم: رێگا بازرگانییەکان:

رێگا بازرگانییەکان رۆڵێکی گرنگ لە سەرهەڵدان و پەرەسەندنی بازرگانی دەبینن، بەتایبەت بازرگانیی دەرەکی، چونکە بەبێ بوونی ئەو رێگایانە گواستنەوەی کاڵا لەنێوان ناوەندە بازرگانییەکاندا زۆر قورس دەبێت. سەبارەت بەرێگا بازرگانییەکان لە چاخە کۆنەکاندا، توێژەر بۆ دیاریکردنیان بەشێوەیەکی وورد دووچاری گیروگرفتی زۆر دەبێتەوە، سەرەرای ئەوەی بازرگانان گرێبەستیان تۆمار کردووە، بەڵام زانیاری لەبارەی ئاراستەی رێگاکانەوە ناخەنە روو. پاشماوەی رێگا باریك و خۆڵییەکان تەنها شوێنی هاتووچۆی گوێدرێژو عەرەبانەیەکی بچووك بوون، کە بەهۆی کارتێکردنی سروشت و لەناوچوونی شارەکانەوە شوێنەواریان نەماوە[٧٢٤].

توێژەران بۆ دۆزینەوەی ڕێگاکان پەنا دەبەنە بەر دیاریکردنی ئاوایی و شارە کۆنەکان. بەو شێوەیە دەتوانرێت ئاراستەی ڕێگاکان بدۆزرێتەوە، یان دیاردە سروشتییەکان، وەك ئەو ڕێگایانەی کە لە ئەنادۆڵ و دەربەندەکانی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس لەو زنجیرانە ئاوا دەبوو، چونکە چیاکان ڕێگر بوون لەبەرامبەر ئاوابوونی کاروانە بازرگانییەکان[٧٢٥].

هەروەها بەلێکدانەوەی هەڵکەوتەی ناوەندە پیشەسازی و بازرگانییەکان لەلایەك و سەرچاوەی کەرەستە خاوەکان لەلایەکی ترەوە، وەك ڕێگاکانی نێوان سەرچاوەکانی بەردی بەنرخی لازوەرد لەخۆرهەڵاتی زاگرۆس و وڵاتانی بابل و ئاشوور[٧٢٦]و شارە کۆنەکانی کوردستان، کە پێویستیان بەو کەرەستە خاوانە هەبووە، وەك ڕێگاکانی دەربەندی ڕایات لەنزیك ڕەواندوز و ڕێگای شارەزوور کە لە هەڵەبجەوە بەرەو ناوچەکانی دەریاچەی ورمێ و ئازەربایجان دەچوو[٧٢٧] ئەمە لەلایەك، لە لایەکی ترەوە بۆ وڵاتی (لوللو – شارەزوو) لەوێشەوە بۆ ئەراپخا دەچوو[٧٢٨]. ڕێگایەکی تریش هەمان ناوچەکانی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس بە (ئەراپخا)و ئاشوور دەبەستەوە. ئەوەش ئەو ڕێگایەیە، کە لەدەربەندی بیتوێنەوە لەناوەندی شمشارەوە تێدەپەڕێت[٧٢٩]. ئەم ڕێگایانە دوای تێپەڕبوونیان بە ئەراپخاو ئاشووردا، بەلێوارەکانی ڕووباری دیجلەدا دەچنەوە کەرانە (تەل ئەلرماح)[٧٣٠]و لەوێشەوە بە (شاغربازار) لەدۆڵی خاپوور، بەرەو خۆرئاوا بە (ئورکیش) دا[٧٣١] تێدەپەڕی، تا دەگەیشتە دەربەندی (ئۆگاریت – ڕەئس ئەلشەمرا) لە کەناری دەریای ناوەڕاست لە سوریادا[٧٣٢].

بە پێی گەشتی هەندێ بازرگانان کەلەنامەو تۆمارەکانیاندا نوسراوەتەوە، ئەو بازرگانانە زۆرجار لایانداوەتە ناوەندە بازرگانییەکان بەو شێوەیە زیاتر ڕوون دەبنەوە، وەك ئەو ڕێگایەی، کە لە ئورکیشەوە بەرەو دەریای ناوەڕاست دەڕۆشت[٧٣٣].

لەباشووری خۆرهەڵاتی ناوچەکانی ئەراپخاوە ڕێگایەکی تر هەبووە، کە لە خانەقینی ئێستاوە ناوچەی دیالەی دەگەیاندە بانەکانی ئێران و هەمەدان[٧٣٤]. لە هەرێمی دیالەدا دەوڵەتی ئیشنونا، کە لە سەرەتای (هەزارەی دووەمی)ی پێش زایینەوە دامەزرابوو، هەمیشە دەیویست لەڕێگەی جەنگەوە دەست بەسەر ئەو ڕێگایانەدا بگرێت، کە لە خۆرهەڵاتی دیجلەو خوارووی ئەراپخادا بەرەو ئاشوور دەچوون، چونکە دەروازەیەك بوو بۆ ماری و دەریای ناوەڕاست، تا خۆیان بەسەر ئەو بازرگانییەدا زاڵ بن[٧٣٥]، ئەم ڕێگایە بە (لوبدی)و (ئارامودا – Aramu)[٧٣٦] تێپەڕ دەبوو، لە باشووری خۆرهەڵاتی (نوزی)[٧٣٧]. لە باشوورەوە ڕێگایەکی تر هەبوو لەدەقەکانی نوزیدا باس کراوە، کە بە چەند ئاواییەکدا بەرەو وڵاتی کاشی تێپەڕ دەبوو، وەك: (ئەپیل – سین)و (دور – ئوبلا)[٧٣٨]. لە باکووری خۆرئاوای نوزییەوە، لەتورشا لەسەر زێی بچووك، کە نزیکەی (٤٢)کم لە (نوزی) دوور بوو. ڕێگایەکی تر هەبووە بەرەو ئاشوور، هەروەها (قابرا) لەلای باکووری خۆرئاواوە بەرەو ئاشوورو ئەربیلوم دەچوو، کە گرنگترین بازرگانی بەرەو ئاشوور وەك ناوچەیەکی ترانزێت وابووە[٧٣٩].

**پێنجەم: ئامرازەکانی گواستنەوە:**

ئامرازەکانی گواستنەوە ڕەگەزێکی گرنگی بازرگانین و ڕۆڵێکی گرنگ لە پەرەسەندنیدا دەبینن، قەبارەی بازرگانی دەرەکی پەیوەستە بەم ئامرازانەوە، بۆ هەناردەو هاوردە ڕێخۆشکەرن.

لە نوزیدا زیاتر ڕێگا ووشکانییەکان بەکارهاتوون، وەك زانراوە لەو چاخانەدا زیاتر گوێدرێژ بۆ گواستنەوە بەکارهاتوون، چونکە نرخی ئەم ئاژەڵانە لە (نوزی) لە ئەسپ هەرزان تر بوون و لەدەقەکاندا ئاماژە بەو گواستنەوەیە کراوە: (Gud ālpu) واتە باری گا، (ANŠE Imeru) واتە باری گوێدرێژ، بەتایبەت لە گواستنەوەی دارو دانەوێڵەدا[٧٤٠].

سەبارەت بەگواستنەوەی ئاویی زانیاری زۆر لەبەردەستدا نییە، بەڵام تەنها ڕووباری زێی بچووك[٧٤١] ڕێی تێدەچێت بەهۆی بەلەمەوە بۆ گواستنەوەی دار بەکارهاتبێت، بەڵام لەبەر سووکی، دارەکە لەسەر ئاودا دەوەستێت و زۆرجار دەکرانە ناو ئاوی ڕووبارەکان، بەتایبەت ئەگەر لە باکوور بەرەو باشوور بوو بێت، بەوەش کارەکە ئاسانتر دەبێت و کەمتری تێدەچێت.



*** دەرئەنجام:**

بە ئەنجامدانو کۆتاییهاتنی توێژینەوەکە گەیشتینە چەند دەرئەنجامێك، وا لەخوارەوەدا گرنگترینیان دەخەینە ڕوو:

١. هەڵکەوتەی جوگرافیایی شارەکە لە ناوچەیەکی گرنگدا، بەدرێژایی مێژوو کاریگەری لەسەر پەرەسەندنو ڕووداوەمێژووییەکانو ژیانی ئابووریو پێکهاتەی دیمۆگرافیی شارەکەدا هەبووە.

٢. پێش کۆچی ئەکەدیو ئاشووری بۆناوچەکەو داگیرکردنی لە هەزارەی سێیەمی پێش زایینداً، ئەو ناوچەیە لەلایەن دانیشتووانێکەوە ئاوەدان بوو، کە بە سووباری ناودەبرێن، پاشانیش گوتییەکان. لە کۆتاییەکانی هەزارەی سێیەمەوە، بەتایبەتی لە سەرەتای هەزارەی دووەمدا، گۆڕانێك لە پێکهاتەی دانیشتووانداً ڕوویدا، ئەویش زاڵبوونی دانیشتووانی خوری زمان بوو بەدرێژایی هەزارەی دووەمی پێش زایيندا.

٣. زێدەڕۆیی لە بوونی گرووپە (هیندۆ – ئارییەکان) لەو سەردەمەدا کراوە، کە تا ئێستا بە هۆی نەبوونی بەڵگەی تەواو، نەتوانراوە بەتەواوەتی یەکلابکرێتەوە.

٤. (نوزی) کەوتووبووە نێوان چەندین شارستانییەتی جیاجیا، لە باشوورەوە شارستانییەتی سۆمەریو ئەکەدی، لە خۆرئاواوە ئاشوور، لە باکووری خۆرهەڵاتەوە شارستانییەتی گەلانی زاگرۆس. لە هەزارەی دووەمیشدا کەوتە ژێر کاریگەری شارستانییەتی خوری. ئەوەش بووبووە هۆی سەرهەڵدانی شارستانییەتێکی تێکەڵ، بۆیە وەك خاوەن شارستانییەتێکی تایبەتمەند دەردەکەوێت.

٥. ئەم شارە لە نزیکەی هەزارەی پێنجەمی پێش زایینەوە ئاوەدان بووەو لە هەموو چاخە مێژووییەکاندا، جگە لە هەندێ ماوەی کورت، ژیان تێیدا بەردەوامبووە، تا چاخە مێژووییەکان. لە چاخی بنەماڵەکانو ئەکەدیدا ناوەندێکی گرنگی ئابووریو کارگێڕی ناوچەکە بووە. لەچاخی بنەماڵەی سێیەمی ئوردا گرنگییەکی زۆری هەبووە، وەك دەروازەیەك بۆ ناوچەکانی خۆرهەڵاتو باکووری ناوچەکە بووە.

٦. دوای دەرکەوتنی شانشینی (ئەڕاپخا) لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پێش زاییندا، (نوزی) ئاوەدانکراوەتەوەو بوو بووە ناوەندێکی گرنگی. سنووری ئەوکاتی (ئەڕاپخا) نزیکەی هەموو ناوچەکانی پارێزگای کەرکوکی دەوڵەتی گرتبۆوە.

٧. لە ناوەراستی هەزارەی دووەمی پێش زاییندا، (نوزی) بووبووە گەورەترین ناوەندی ئابووریو کارگێڕی دەوڵەتی میتانی. لە ناوخۆیدا توانیبووی پێداویستییەکانی ناوخۆ لە هەموو جۆرە بەروبوومێکی کشتوکاڵی دابین بکات، پیشەسازییە دەستییەکان بەرادەیەکی زۆر گەشەیان سەندبوو، کە بووە هۆی سەرهەڵدانی بازرگانی دەرەکی، چ لە ڕووی هێنانی کەرەستەی خاو، یان ناردنە دەرەوەی بەرهەمە پیشەسازییەکان.

٨. زۆربەی چالاکییە ئابوورییەکانی (نوزی) لەلایەن کۆشکەوە ئەنجام دەدران، دەسەڵاتدارانی شارەکە کۆمەڵێك یاسایان بەشێوەیەك دانابوو، کە بوو بووە هۆی ئەوەی زۆربەی زەویو زارەکانی ناوچەکە بۆ خاوەندارێتی کۆشك بگەڕێتەوە. پیشەسازەکانیش هەر بەشێك بوون لە دەزگایەکی ئابووری سەربە کۆشك. زۆربەی چالاکییە بازرگانییەکانی دەرەوەش لەلایەن چەند کەسێکەوە بەڕێوەدەچوون، کە بەرامبەر بەو کارە کرێیان وەردەگرت، ئەمانە بە (تامکارو) ناسرابوون. بەڵام کەرتی تایبەتیش بەپلەیەکی لاوەکی لە هەموو ئەو بوارانەدا هەبووە.



*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. لە (OLZ) بلاوی کردەوە.
٢. ئەو سەرچاوانەی لەبەردەستدان هیچ زانیارییەکی تر دەربارەی ئەم شارە ناخەنە روو.
3. Al - Rawi، F.N.H. (Studies in the Commercial Life of an Administrative Area of Eastern Assyria in the 15 Century BC)، based on published and Unpublished Cuneiform texts، Ph. D. Thesis (Unpublished)، University of Wales (Cardiff)، 1988، P. (28).
4. Al - Rawi، F.N.H.، (Studies in the Commercial Life of..)، P. (29).
٥. كييرا، ادوارد، (كتبوا على الطين)، ترجمة: د.محمود ياسين الامين، مراجعة. علي خليل، بغداد، ١٩٦٤، الصفحة (٢٠١).
٦. المصدر السابق، الصفحة (٢٠٢).
٧. كييرا، المصدر السابق، الصفحة (٢٠٢).
8. Gelb، Purves and Macr، (Nuzi Personal Names)، in: (OIP)، Vol. LVII، Chicago، 1963، P. (1).
9. Maidman، (Nuzi، Portrait of an Ancient Mesopotamia Provincial Town)، in: (CANE)، 2001، P. (934).
10. Gelb، Others، (Nuzi Personal Names)، P. (1).
11. Lewy، (Nuzi Mescellanea)، in: (OrNS)، Vol. 28، Roma، 1959، P. (5).
12. Friedmann، Alec H.، (Toward a Relative Chronology at Nuzi)، in: (SCCNH)، Vol. 2، Eisenbrauns، 1987، P. (116).
13. Scafa، P. Nigri، (The Scribes of Nuzi)، in: (SCCNH)، Vol. 10، Bethesda Maryland، 1999، Pp. (66 - 67).
.١٤

١٥. جێی سەرنجە کەوا ئەم زنجیرە چیایانەی دەورووبەری کەرکوك لە نەخشەیەکی کۆنی نوزیدا، کە بۆ هەزارەی سێیەمی پێش زایین دەگەرێتەوە کێشراوە، بروانە:
- گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٦٣)، بەغدا، ١٩٨٨، لاپەرە (٤٤)، لێکۆلینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(کۆنترین نەخشەی جوگرافی لە نوزی)، نووسینی: قەرەداغی، فازل.
16. Postgat، J. Nicholas، (Early Mesopotamia - Society and Economy at the Dawn of History)، Published by Routledge، London، 2003، P. (11).

١٧. المنذري، منذر، (نصوص ادارية، قضائية من تل فخار، مدينة كورروخانني)، رسالة ماجستير (غير منشور)، مقدمة الى كلية الآداب، جامعة بغداد، بغداد، ١٩٩٩، الصفحة (١٦).
١٨. لە چاخە کۆنەکانەوە ئەم سنوورە سروشتییە هەرێمی (ئەراپخا)ی لێ پێکهاتووە، کە نزیکەی هەمان سنووری پارێزگای کەرکوك بووە، بەلام بە هۆی سیاسەتی حکومەتەکانی عێراق ١٩٥٨ - ٢٠٠٣ گۆراوە.
١٩. بروانە:
- Fincke، J.C.، (Transport of Agricultural Produce in Arraphe)، in، M.A (jas) RANM، LXXXVIII، 2000، P. (147).
- احمد، جمال رشيد، (دراسات كوردية في بلاد سوبارتو)، الصفحة (٢٩).
٢٠. عومەر، عەبدوللا عامر، (بەرزیو نزمی رووی زەوی هەرێمی کوردستان)، کۆمەلێك مامۆستای زانکۆی سەلاحەددین، هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەولێر، ١٩٩٨، لاپەرە (٥٥ - ٥٦).
21. Helga Schneider - Ludorff، (Öle und Fette in Nuzi)، in: (SCCNH)، Vol. 10، Maryland، 1999، P. (401).
٢٢. بروانە:
- قارەمان، لەیلا محەمەد، (خاکی هەرێمی کوردستان)، لە: (جوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق)، کۆمەلێك مامۆستای زانکۆی سەلاحەددین)، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٨، لاپەرە (٨٤ - ٨٥).
- مجلة (سومر)، المجلد (٢٦)، بغداد، ١٩٧٠، الصفحة (٥٢)، موضوع بعنوان:
(تل الفخار حفريات الموسم الاول ١٩٦٧ - ١٩٦٨)، كتابة: الخالصي، مةحموود ياسين.
٢٣. هەروەها بە (سیموروم)ش تۆمارکراوە، بیروڕای جیاواز دەربارەی شوێن یان سنووری (شیموروم) هەیە، ژمارەیەکی زۆر لە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ناوچەکانی پردێی ئێستا لە سەر زێی بچووك لە باکووری کەرکوك دەکەن، زۆر جار لەگەل (زابان)دا ناوی هاتووە، بروانە:
- Astour، (Semites and Hurrians in Northern Transtigris)، in: (SCCNH)، Vol. 2، Eisenbrauns، 1987، P. (8، 40 - 41).
رای تر هەیە شوێنی (شیموروم) لەو سەردەمەدا بۆ ناوچەکانی رووباری سیروان دەگێرێتەوە، (فراین) پێی وایە کە دەکەوێتە قەلای شێروانەی ئێستا، بروانە:
- (The Zagros Campaigns of Šulgi and.Amar - Suena)، in: (SCCNH)، Vol. 10، Maryland، 1999، P. (148).
لە سالانی نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا دەقێکی پاشایەکی (شیموروم) دۆزرایەوە، کە ناوی (ئیدی - سین) بووە، لەو دەقەدا باس لە بەزاندنی چەندین هێزی ناوچەکەی کردووە، خۆی بە پاشای مەزن ناوزەدکردووە، بە پێی ئەو دەقە، کە لە ناوچەکانی دوکانو نەخشێکی کورێکی ئەم پاشایەش

- Poebel، A، (The Assyrian King list from Khorsabad)، in: (JNES)، Vol. 1، Chicago، 1942.
- Postgat، J. Nicholas، (Early Mesopotamia - Society and Economy at the Dawn of History، Published by Routledge)، London، 2003.
- Purves، Pierre M، (Additional Remarks on Nuzi Real Property)، in: (JNES)، Vol.، VI، Chicago، 1947.
- Raof، Michael، (Cultural Atlas of Mesopotamia and The Ancient Near East)، London، 2000)
- Saarisalo، AApeli، (New Kirkuk Documents Relating to Slaves)، SO، Vol. 3، Helsinki، 1934.
- Sasson، J، (Reliogion and Science، From Hittete Mythology Kumarbi Cycle)، in: (CANE)، Vols. 3 - 4، (Ed. by J. M. Sasson)، New York، 2001.
- JEN (2)، Text: JENu 691 In: www.infinitive.com. (by Scopio Smith.
- JEN (72)، Text: JENu (236)، In: www.infinitive.com. (by Scopio Smith.
- JEN (75)، Text: JENu 202، In: www.infinitive.com. (Published by Scopio Smith.
- JEN، (82)، Text: JENu 600 In: www.infinitive.com. (Published by Scopio Smith.
- JEN، (284)، Text: JENu 227 In: www.infinitive.com. (Published by Scopio Smith.
- EN 9/143، Text: SMN 2650، In: www.infinitive.com. (Published by Scopio Smith.
- Scafa، P. Negri، (Scribes of Nuzi)، (SCCNH، ) Vol. 10، Bethesda Maryland، 1999.
- Speiser، E. A، (Introduction to Hurrian)، in: (AASOR) Vol، 20، New Haven، 1941.
- Speiser، E. A، (Nuzi Marginalia)، In: (OrNS)، Vol.، 25، Roma، 1956.
- Starr، R.، (Report on the Excavation at Yorghan Tepa Near Kirkuk، Iraq Conducted by Harvard University in Conjunction with the American Schools of Oriental Research and the university Museum of Philadelphia (1927 - 1931. Nuzi، Vol. 1 (texts)، Chicago، 1939.
- Steinkeller، P.، (The Historical Background of Urkesh and the Hurrian Beginnings in Northern Mesopotamia)، Urkesh and the Hurrians (Studies in Honor of L. Cotsen)، in: (BM)، Vol. 26، Malibu، 1998.
- Wilhelm، G، (Hurrian)، in: (CEWAL)، 2002.
rior at Nuzi)، in: (SCCNH)، Vol.، 1، Eisenbrauns، 1981.
- Kuhrt، Amélie، (Ancient Near East، from 3000 to 1200 BC)، Vol. 1، Philadelphia، 2002.
- Kühne، Cord، (Imperial Mittanni: An Attempt at Historical Reconstruction)، in: (SCCNH)، Vol.، 10، Bethesda Maryland، 1999.
- Labat، R، (Manual D'Epigrafie Akkaddienne)، Paris، 1952.
- Levy، S. J، (Harmal geographical List)، in: (Sumer)، Vol. 3، No. 1، Baghdad، 1947.
- Lewy، H، (Gleanings from a New Volume of Nuzi Texts)، Or NS، Cincinnati، Vol.، X، Ohio، 1941.
- Lewy، H، (The Nuzian Feudal System)، OrNS، Vol.، XI، Roma، 1942.
- Lewy، H، (Miscellanea Nuziana)، OrNS، Vol. 28، Roma، 1959.
- Lewy، H، (The Titennûtu Texts from Nuzi)، OrNS، Vol.، X، Roma، 1941.
- Maidman، P. Maynard، (Nuzi: Portrait of an Ancient Mesopotamia Provincial Town)، in: (CANE)، Vol.I - II، (Ed. by J. M. Sasson)، New York، 2001.
- Malwan، M. E، (The Excavation at Tell Chagharbazarand an Arcaeological Survey of the Ĥabur Region)، in: (IRAQ)، Vol.، IV، London، 1937.
- Morrison، Martha A، (Evidence for Herdsmen and Animal Husbandry in the Nuzi Documents)، in: (SCCNH)، Vol.، 1 - 1981.
- Müller، G، (The Geographical of the Nuzi Area)، in: (SCCNH)، Vol. 10، Bethesda Maryland، 1999.
- Oates، David، (Studies in the Ancient History of Northern Iraq)، Oxford University Press، London، 1968.
- O'Callaghan، Roger، (Aram Naharaim، A Contribution to the History of Upper Mesopotamia in the Second Millennium B. C)، in: (An Or)، Vol. 26، Roma، 1948.
- Openheim، lio، (Babylonia and Assyrian Historical Texts، The Story of Idrimi King of Alalakh)، in: (ANET)، (Relating to the Old Testament)، Ed. By James B. Pritchard، 3rd Edition، New Jersey، 1969.
- Owen، D. I، (An Old Assyrian Letter from Nuzi)، in: (SCCNH)، Vol. 2، Eisenbrauns، 1987.

- Wilhelm، G، (Urartian)، in: (CEWAL)، 2002.
- Wilhelm، G، (The Kingdom of Mitanni in the Second - Millennium B.C)، in: (CANE)، Vol.I - II، (Ed. by J. M. Sasson)، New York، 2000.
- Wilson، John A، (Eygptian Historical Texts - The Asiatic Campaigns of Tut - mose III)، in: (ANET)، (Relating to the Old Testament)، Ed. By James B. Pritchard، 3rd Edition، New Jersey، 1969.
- Zaccagnini، C، (The Merchant at Nuzi)، in: (IRAQ)، Vol.، 39، Part 2، London، 1977.
- Zaccagnini، C، (A Note on Nuzi Textiles)، in: (SCCNH)، Vol.، 1، 1981.

* سەرچاوە ئەڵمانییەکان:

- Müller، Manfred، (Getreideertragsabgaben an den "palast" im Hurritischen Staat Arrapĥe)، in: (SCCNH)، Vol.، 1 - 1981.
- Schneider - Ludorff، Helga، (Öle und Fette in Nuzi)، in: (SCCNH)، Vol.، 10 - 1999.

*** پاشکۆکان:**

**- پاشکۆی یەکەم:**

**دەقی نامەکەی (شەوشتەتار) پاشای میتانی بۆ ئیتخی تیشوپ پاشای (ئەراپخا)**

بڕوانە: (Lewy، (NFS)، in: (OrNS)، Pp. 33 - 34).

H IX 1.
1. a - na mIt - ĥi - ia qí - bí - ma
2. um - ma šarru - ma
3. âlPa - - ĥa - ar - ra - šeki
4. ša a - na f Am - mi - na - i - e ad -di - nu [ù]
5. I - na - an - na iš - tu li - e - ti - šu
6. âlaki a - na mÙkí at - ta - din - [mi]
7. a - nu - um - ma mSa - uš - sa - at - ti
8. awîlĥal - şu - uĥ - lu ša âlA - ti - luki
9. a - na Pâ - ţêmeš -šu - nu a - na šu - ú - li - i aš - pur - š[u]
10. ki - na - an a - na mŠa - uš - sa - at - ti
11. aq - ta - bi pâta - šu - mi
12. ša f Am - mi - na - i - e - mi šu - ú - ma - mi
13. mÙkí - mi a - na pâtí - šu - mi
14. ša f Am - mi - na - i - e - mi
15. lu la -ir - ru - um - mi
16. ù fAm - mi - na - i - e - mi (Lo. E).
17. a - na pâtí - šu - ša mÙkí
18. lu la e - ir - ru - um - mi (Rev.)
19. ù a - na pâtí - šu - ša fAm - mi - na - i - e
20. ma - am - ma la e - ir - ru - ub
21. âlaki -ka4 i - na pâtí - šu a - na fAm - mi - na - i - e
22. at - ta - din
23. ù lu - ú ti - i - de4

Seal:
1. Ša - uš - ša - at - tar.
2. mâr Pâr - sa - ša - tar.
3. šar Ma - I - te - ni.

1. To Itĥiia speak.
2. thus (said) the king.
3. (As regards) the town of Pa'ĥarrašše.
4. which I gave to Amminaie، [and].
5. now from her territory.
6. I gave the town to Uki.
v. Herewith I dispatched Saušsatti.
8. the Ĥalsuĥlu of the city of Atilu.

9. for the definition of their territories.
10. Thus I spoke to Saušsatti.
11. "the (other) territory.
12. of Amminaie (remains) the same (and).
13. Uki positively shall not encroach upon the territory.
14. of Amminaie.
15. And Amminaie.
16. positively shall not encroach.
17. upon the territory of Uki.
18. And.
19. nobody shall encroach.
20. upon the territory of Ammina".
21. A town of your in her territory.
22. I gave to Amminaie.
23. And do take notice.

به نیتخیا بلێ: بەم شێوەیە (وەهای گوت) پاشا: (سمبارمت) شاری پەخاراش کە دابووم بە ئەمینای، (و) دەولەت لە ناوچەکەی ئەودا، من شارەکەم دا بە ئوکی. هاوکات. سەوشساتتی، (خالسوخلو)ی شاری ئەتیلوم نارد. بۆ دەستنیشانکردنی سنوورەکانیان (ناوچەکانیان)، بەمشێوەیە گوتم بە سەوشساتتی: "هەرێمەکانی (تری) ئەمینای وەکو خۆی دەمێنێتەوە (و) ئوکی، دەستدرێژی ناکاتە سەر ئەمینای و ئەمینای دەستدرێژی ناکاتە سەر هەرێمی ئوکی. و کەس دەستدرێژی ناکاتە سەر هەرێمی ئەمینای". ئەو شارەی تۆلە هەرێمی ئەودا، من دام بە ئەمینایی. بۆ ئاگاداریتان!.

مۆر: (شەوشتەتار) کوڕی پارساشەتار، پاشای میتاننی

تێبینی:
بۆ یەکەم جارە لە توێژینەوەیەکدا بە زمانی کوردی بڵاوبکرێتەوە.

**- پاشکۆی دووەم:**

**لیستی پاشایانی میتانی:**



پاشکۆی(2)

لیستی پاشایانی میتانی

شوتتارنا-1 کوڕی کیرتا؟ (لەرووی خوێنەوە روون نییە)

↓

**پاراتارنا**-1

↓

شەوشتەتار (کوڕی پارساتەتار)

↓

ئەرتەتاما-1

↓

شوتتارنا-2 کوڕی ئەرتەتاما

شوتتارنا-3 | توشراتا | ئەرتەشومرا

توشراتا

↓

شاتتیواززا

↓

شاتتیوارا

↓

وازاشاتتا

195

*** پاشکۆی سێیەم:**

**(کێش)ەکان بەرامبەر بە هی ئێستا:**

| بەرامبەر بە کێشی ئێستا | SE | Gin - Tur | GIN | Ma.Na | GU | واتا | ناوی کێش | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | | بە ئەکەدی | بە سۆمەری |
| ٣٠,٣ كغ | – | – | – | ٦٠ | ١ | تالنت | biltu | GU |
| ٥٠٥ غ | – | – | ٦٠ | ١ | – | مين | Mana | Ma.Na |
| ٨٠٤ غ | ١٨٠ | ٦٠ | ١ | – | – | – | شيكل | GIN |
| ٠,١٤ غ | ٣ | ١ | | – | – | شيكلى بچووك | – – | Gin - Tur |
| ٤١,٧٥ غ | ١ | – | – | – | – | – | – | SE |

**بڕوانە:**

**- الأعظمي، (حمورابي)، الصفحة (١٩٣).**

**پاشکۆی چوارەم**



**مۆری ئیتخی - تیشۆب**



پاشکۆی (٧) شارەکانی سوبارتوو لە هەزارەی سێیەمی پێش زاییندا



وانە:

Buccellati, Giorgio and Marilyn K. Buccellati: "The Royal Storehouse of Urkesh, in:AF

پاشکۆی (٩) شانشینی ئاراپخا لە سەدەکانی ١٤و١٥ ی.پ.ز دا

بروانە: بەدەستکارییەوە.

Müller, G. "The Geographical of Nuzi Area", in: SCCNH

**پاشکۆی (١٠)**




بڕوانە: بە دەستکارییەوە "Mitanni Kingdom in the Second Millennium B.C", in: CANE, Vol.I-II

*** کەرکوك و گەرمیان لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پ.ز. لە (سەردەمی بابلیی کۆن)دا :-**

د. کۆزاد محەمەد ئەحمەد
بەشی شوێنەوار - زانکۆی سلێمانی

گەرمیان بەهۆی شوێنە جوگرافییەکەیەوە ناوچەیەك بووە هەمیشە یەکەمین سەنگەر بووە لەبەرامبەر هەر هێرش و شالاوێك کە لە دەوڵەتەکانی باشوورەوە رووی لە خاکی کوردستانی کۆن کردووە. بە هەمان شێوەش، دوا پێگە بووە کە هێزەکانی گەلان و دەوڵەتەکانی کوردستانی کۆن بۆ هێرش کردنە سەر دەوڵەتەکانی ناوەراست و باشوور ی مێسۆپۆتامیا لێوەی دەرچوون، بە هۆی نزیکییەوە لەو ناوچانەوە و نزیکیشی لە چیاکانی زاگرۆس کە کەوتوونەتە رۆژهەلاتییەوە.

کەرکوك و ناوچەکانی گەرمیان لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پ.ز. دا گۆرانکارییەکی سیاسییانەی گەورەیان بەسەردا هات. لە ٢٠٠٤ پ.ز. دا بنەماڵەی سێیەمی ئور رووخێنرا و پایتەختەکەیان کە شاری ئور بوو وێرانکرا[١] ئەمە بۆ گەلانی کۆنی کوردستانی دێرین، بەتایبەتی ناوچەی گەرمیان هەلێکی زێرین بوو بۆ رزگارییان و بۆ ئەوەی قەوارەی سیاسیی خۆیان پەرە پێبدەن و فراوانی بکەن. ئەوەبوو لەم سالە بەدواوە کۆتایی بە زنجیرە شەر و پەلامارەکانی ئیمپراتۆریی بنەماڵەی سێیەمی ئور هات و دەوڵەتی سیمورروم (یان شیمورروم) لە گەرمیاندا دەرکەوت کە پێشتریش وەك قەوارەیەکی سیاسی، ئەگەرچی بچووکتربوو، هەر هەبوو و سالانێکی دوور و درێژ بەرگرییەکی بێ ووچان و ئازایانەی بنەماڵەی سێیەمی ئوری کردبوو.[٢] سیمورروم ناوی شارێك بوو کە پایتەختی ئەو شانشینە بوو کە هەر بەو ناوەوە ناسراوە. هەرچەندە شوێنی ئەم پایتەختە بە ووردی نازانرێت کوێ بووە، بەلام ئەوەندە دەزانین کە لە سیروان نزیك بووە و بەلگەکان ئەوە نیشان دەدەن کە زۆر پێدەچێت لە شوێنێکی نزیك شیروانە بووبێت. خەلکی ئەم شانشینە خەلکی ناوچەکە خۆی بوون، ئەو ناوچەیەی لە سەردەمانی زۆر کۆنەوە نیشتیمانی گەلە کۆنەکانی کوردستانی دێرین بووە، بە تایبەتی گوتییەکان کە ئەوانیش یەکێك لە دانیشتووانی گەرمیان و دەوروبەری بوون. بەلام هەر لە کۆتایی هەزارەی سێیەمی پ.ز. ەوە ئیتر ناوی خورییەکان لەسەرچاوە نووسراوەکاندا بەر چاو دەکەون و بەلگە لەسەر گەیشتنی کۆچ هێنەرانی خوری بە ناوچەی گەرمیان پەیدا دەبن، بەبەلگەی بوونی ناوی شوێنی خوری زمان لە ناوچەکەدا. گرنگترین بەلگە بۆ ئەمە ناوی یەکێك لە سالەکانی (نەرام-سین)ی پادشای ئەکەدە کە سالەکەی ناونراوە "ئەو سالەی (نەرام-سین) لە کیراشێنیوێ بەسەر (نیری؟) سیمورروم دا سەرکەوتوو بوو و بابا، (ئێنسی)ی سیمورروم (و) دوبول، ئێنسیی ئەرامیی بەدیل گرت."[٣]

پادشای سیمورروم لەو کاتەدا ئیددید(ن)-سین بوو کە پادشایەکی بەهێز و توانا بووە و توانیویەتی قەلەمرەوی شانشینەکەی بەلایەنی کەمەوە تا بێتواتە بگەیەنێت بە ناوچەکانی سەر رۆخی زێی خواروەوە. ئەمەش ناکرێت ئەگەر ناوچەی کەرکوکی لەژێر دەستدا نەبووبێت. واتە بێگومان ناوچەی کەرکوکیش هەر لەقەلەمرەوی سیمورروم دا بووە و لەوێوە بە تەوەری زێی خوارووا بەرەوە دەشتی دوکان و بیتوێن هەلگەراوە و تا بێتواتەی گرتووە. ئەم زانیارییانەمان لە نووسینەکانی ئەم پادشایەوە بۆ دەرکەوتووە، بە تایبەتی بەردەکەی غەریب هەلەدنی، کە تیایدا ناوی ئەو خاك و ولات و ناوچانەی بردووە کە ئیددید(ن)-سین داگیری کردوون.[٤] لە رێی سەرچاوەکانی ترەوە بۆمان دەرکەوتووە کە پاش ئەم پادشایە کورێکی بەناوی (زابازونا) وە جێی گرتووەتەوە و نازانرێت چەند فەرمانرەوایی کردووە، بەلام ئەوەندە زانراوە کە پاشتر دەسەلاتی سیمورروم کز دەبێت و هەندێك هێزی تر دێنە کایەوە کە جێی دەگرنەوە. ناوچەی کەرکوك و گەرمیان بۆ ماوەیەك دەکەونە ژێر رکێفی ئەو هێزەوە کە بە شانشینی (ئێشنوننا Ešnunna) ناسراوە. ئەم سەردەمەی کە تیایدا شانشینی ئێشنوننا لە ناوچەکەدا بالادەست بوو پێی دەووترێت سەردەمی بابلیی کۆن و لە باکووری مێسۆپۆتامیا هەمان سەردەم ئاشووریی کۆنی پێ دەووترێت.[٥] بەداخەوە بۆ مێژووی سەردەمی راستەوخۆ دوای رووخانی بنەمالەی سێیەمی ئور لە ناوچەکانی سیروان و گەرمیان و تەنانەت ناوچەی دیالە سەرچاوە نووسراوەکان بۆ ماوەی سەدەیەك بێدەنگن و نازانرێت لەو سەدەیەدا بە ووردی چی گوزەراوە. سەرچاوەکان ئیتر لە دەورووبەری ١٩٠٠ پ.ز. ەوە دەردەکەوونەوە و زانیاریمان لەسەر ئەو ناوچانە دەست دەکەوێتەوە.[٦]

لە سەرچاوەکاندا ئاماژەیەکی راشکاوانە بۆ کۆتایی هاتنی دەسەلاتی سیمورروم نەهاتووە، بەلام دەتوانین ئەوە هەلبهێنجێنین کە لەلایەکەوە گەورەبوون و بەهێزبوونی ئێشنوننا رۆلی لە لاوازکردن و داگیرکردنی خاکەکەیدا هەبووە و لەلایەکی تریشەوە گوتییەکان رۆلێکی بالایان هەبووە. بەلگەی ئەمەی دواییان لە نامەیەکدا هاتووە باس لە بەدەستەوەدانی پادشای سیمورروم بە 'زازوم Zazum' ی پادشای گوتی دەکات لەلایەن زازییا ی پادشای توروککییەکانەوە، ئاماژەی بەوەش کردووە کە ئەو پادشایەی سیمورروم پێشتر لای گوتییەکان بوبوو و بۆلای توروککییەکان هەلاتبوو.[٧] ئەمە واتای ئەوەیە کە دوژمنایەتی و ململانێیەکی توند لەنێوان سیمورروم و گوتییەکاندا هەبووە بۆیە توروککییەکان ئەو پادشا پەنابەرەی سیموررومیان وەك دیاریی رێککەوتن بە گوتییەکان داوە.

سەبارەت بە 'ئێشنوننا Ešnunna'ش، یەکێك لە دەوڵەتە زۆرەکانی سەردەمی بابلیی کۆن بوو، دامەزرێنەرانی سامی نەژاد بوون. پایتەختی ئەم دەوڵەتە شاری ئێشنوننا بوو کە ئێستا (تەل ئەسمەر) ی پێ دەووترێت و لە ناوچەی 'خەفاجی' یە لە رۆژهەلات و باکووری رۆژهەلاتی بەغدا. ئەم دەوڵەتە لە پاش کزبوونی دەسەلاتی سیمورروم فراوان بوبوو و پەلی کێشابوو بۆ ناوچەکانی سەرووتر بە درێژایی رووباری

سیروان. ئەم پەلکێشانە زیاتر لەسەردەمی پادشایەکیدا بەدی هاتووە بەناوی دادوشا Daduša، هەرچەندە دوور نییە زووتریش دەستی پێکردبێت، بەڵام ئێستا بەڵگەمان بەدەستەوە نیە ئەمە بسەلمێنێت.

بەپێی سەرچاوە نووسراوەکان ئێشنوننا لەسەردەمی (بیلالاما Bilalama) دا پەیوەندیی لەگەڵ سیموررووم دا هەبووە، لەو کاتەدا کە پادشای سیموررووم زابازونا ی کوری ئیددی(ن)-سین بوو. تەنانەت دۆزینەوەی جێ مۆرێکی زابازونا لە چینێکی ژێر چینەکەی سەردەمی بیلالاما دا لە تەل ئەسمەر بەڵگەی ئەوەیە کە زابازونا پێش بیلالاما بە پادشایەتیی سیموررووم گەیشتووە.[8]پاش بیلالاما چەند پادشایەکی تر فەرمانڕەواییان کردووە کە زۆر کەم لەبارەی ڕووداوەکانی سەردەمیانەوە دەزانین، ئەوەندە نەبێت هەندێك نامە دۆزراوەنەتەوە کە باس لە شەڕ و پێکدادان لەنێوان ئێشنوننا و هۆزە ئامورییەکاندا دەکەن کە وا پێدەچێت لەم سەردەمەشدا هەر هەوڵی هاتنە ناوەوە و خاك داگیرکردن و خۆ نیشتەجێکردنیان دابووبێت.[9]

لەسەردەمی فەرمانڕەوایی پادشای ئێشنوننا (ئیپیق-ئەدەد Ipiq-Adad) ی دووەم دا ئاماژە بۆ فراوانبوونی ئەو شانشینە بەرەو ناوچەکانی گەرمیان هەن، لەوانە ساڵێکی فەرمانڕەواییەکەی بە ناوی "ئەو ساڵەی ئیپیق-ئەدەد قەڵای مێ-توران Mê-Turanی داگیر کرد"[10]ەوە ناونراوە.

مێ-توران شارێك بوو لە ناوچەی حەمرین.[11]شاری مێ-توران لە دەقێکی تریشدا ناوی هاتووە و ئاماژەی بۆ مردنی فەرمانڕەواکەی بە ناوی (ئاریم-لیم Arim-Lim) کراوە کە ناوێکی ئامورییە و دیارە لەو کاتەدا شارەکە بەدەست ئامورییەکانەوە بووە.[12]ئەم کەسایەتییە نووسینێکیشی لە مێ -توران دۆزراوەتەوە کە تیایدا نازناوی.*rabiān* MAR TU ی لەخۆی ناوە و واتای گەورەی مارتو (واتە: ئاموری). [13]هەر ئەو شارە فەرمانڕەوایەکی تری سامی (ئەکەدی، بابلی یان ئاموری) ناوی هەبووە بەناوی (ئاخی-ماراص Aḫi-maraṣ) کە ناوی لە دەقێکی بڵاونەکراوەی ئەو شوێنەوارەدا هاتووە.[14]

لە دەقێکی مێژووییدا کە ڕووداوەکانی ئەم سەردەمەی بەپێی ناوی ساڵەکان تۆمارکردووە و لە شاری ماری دۆزراوەتەوە (ناسراو بە MEC)[15]ئەو ساڵەی کە بە ناوی (دادایا Dadāya)ی دووەمەوە ناونراوە بە ساڵی گرتنی ئەرراپخاوە لەلایەن ئیپیق-ئەدەدی دووەمی پادشای ئێشنونناوە تۆمار کردووە[16] کە بەپێی لێکۆڵینەوەی مێژوویی دەکاتە ساڵی ١٨٢٨ پ.ز.[17] ئاماژەیەکی تریش هەیە بۆ داگیرکردنی خورشیتوم Ḫuršītum (کە بە شێوەی ئورشیتوم Uršītum هاتووە) کە هەر لە ناوچەی گەرمیان بووە.[18]ئەمانەدەری دەخەن کە شانشینی ئێشنوننا لەسەردەمی ئەم پادشایەدا ناوچەی مەبەستی ئەم باسەی خستووەتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. جێگای سەرنجە کە هەر لەو سەردەمەدا سەرۆك هۆزێکی ئاموریی تر کە لە ناوچەی ئێشنوننا بووە و هاوپەیمانی پادشایانی ئەوێ بووە، دواتر کوڕەکانی، بە تایبەتی شەمشی-ئەدەد (بە سەمسی-ئەددو ش نووسراوە) لە ناوچەی خابور لە کوردستانی ڕۆژئاوا شانشینێك پێك دەهێنێت و وڵاتی ئاشووریش داگیر دەکات و دەیخاتە سەر شانشینەکەی. شەمشی-ئەدەد هاوپەیمانێتی و دۆستایەتییەکەی سەردەمی باووباپیرانی لەگەڵ پادشایانی ئێشنوننا درێژە پێ دەدات و بە هاوکاری و یارمەتیی ئێشنوننا دەست دەکات بە داگیرکاریی خاك و ناوی ڕۆژهەڵاتی دیجلەش. ئەوەبوو (کاپرا یان قابرا) و نورروگوم و یائیلانوم و چەندین شوێنی تر لە دەشتاییەکانی ڕۆژهەڵاتی دیجلە لە دەشتی هەولێر و نەینەوا بە یارمەتیی دادوشا ی پادشای ئێشنوننا دەخاتە سەر خاکی شانشینەکەی خۆی. لە نامەیەك لە نامەکانی شمشارەدا شەمشی-ئەدەد دەڵێت کە (یاشوب-ئەددو)ی فەرمانڕەوای ئەخازوم سوێندی لایەنگیری و نۆکەریی لە پەرستگای تێششوپ لە ئەرراپخا بۆ خواردووە.[19]ئەمە واتای وایە کە ئەرراپخا پاشتر کەوتووەتە دەستی شەمشی-ئەدەدەوە و لەدەستی ئێشنوننا دا نەماوە. بەڵگە لەسەر ئەمە نامەیەکی تری شمشارەیە کە یەکێك لە دۆست و هاوپەیمانەکان بە ناوی شێپراتو بۆکو-واری ی فەرمانڕەوای شمشارەی نووسیوە و تیایدا هاتووە کە پێشتر ئەم کو-وارییە بۆ ئەو دۆستەی خۆیی نووسیوە: "نیپرام لەلای سەمسی-ئەددو گەڕایەوە و ووتی: هەرچی وەڵامێك لەسەمسی-ئەددوم وەرگرت هەواڵی زۆر باشن، پاش گرتنی ئەرراپخا، بەرەو قابرا دەچێت پێش و ئیشمێ-داگان ی کوری بە ٦٠,٠٠٠ سەربازەوە بۆ گەمارۆدانی نورروگوم نارد."[20] دیسان لە چەند نامەیەکی تری شمشارەدا شەمشی-ئەدەد ئەوەی پیشان داوە کە جار بە جار چووەتە ئەرراپخا و لەوێ ماوەتەوە.[21]

لەو کاتەدا بەهۆی شەڕ و ململانێی توندی نێوان گوتییەکان و تورووککییەکان کە هۆزێکی گەورەی خوری بوون فەرمانڕەوا خورییەکان بە کاتێکی سەختدا تێدەپەڕین. لە دەشتی ڕانیە و بیتوێن شانشینێکی بچووکیان هەبوو کە بەشێك بوو لە شانشینی گەورەی تورووککی، ئەم شانشینە بچووکە پایتەختەکەی شوشەڕا بوو (شمشارەی ئێستا) و فەرمانڕەواکەی، وەك لەسەرەوە ئاماژەی پێ کرا کو-واری بوو. کو-واری بۆ ئەوەی لە هەرەشەی گوتییەکان خۆی بپارێزێت کە خەریك بوو شانشینەکەیان داگیر دەکرد، پەنای بۆ شەمشی-ئەدەد برد. ڕێککەوتنەکەیان وابوو کە کو-واری سەر بە شەمشی-ئەدەد بێت و بچێتە ژێر ڕکێفییەوە بەو مەرجەی ئەو لە مەترسیی گوتییەکان بیپارێزێت. ئەمە جێبەجێ کرا و شوشەڕا پارێزرا، بەڵام پێدەچێت خەڵکی ناوچەکە بەمە نارەزا بووبێتن، بە تایبەتی کە دەبوایە ئەمجا بە هێزی سەربازی کۆمەکی شەمشی-ئەدەد بکەن لە شەڕە نەبراوەکانیدا. بە تایبەتی بۆ گرتنی شاری شیکشاببوم کە پایتەختی شانشینێکی نەیاری شەمشی-ئەدەد بوو لەسەر ڕۆخی باکووری زێی خواروو بوو، زۆر پێ دەچێت تەقتەق یان نزیکی تەقتەق بووبێت. تەنانەت گوتییەکان لە بەری باشووری زێوە، واتە دەورووبەری ناوچەی ئاغجەلەری ئێستا، بەشەو بە کەلەك دەپەڕینەوە بۆ ئەوبەر بۆ شیکشاببوم و دەچوونە پاڵ هێزەکانی ئەوان بۆ بەرگری کردنی لە دژی

شەمشی-ئەدەد و کو-واری ی ژێردەستەی.[٢٢]

بەڵگەی ئەوەی کە خەڵکی ناوچەکە لەو ڕێکەوتن و ژێردەستەییە نارازی بوون ئەوەی کە زۆری نەبرد خورییەکان، دانیشتووانی کۆنی کوردستان، ڕاپەڕینێکیان لە داگیرکاریی ئاشوورییەکان و ئێشنونناییەکان بەرپا کرد و هەموو ناوچەکانی دەشتی ڕانیە و بیتوێنیان لێ پاك کردنەوە. شانشینێکی بەهێزی تورووککییەکان بە فەرمانڕەوایی زازیبا ی پادشایان دروست بوو کە لە چەند ساڵێکدا هەموو دەشتی هەولێر و نەینەوای لە داگیرکاریی ئاشووری پاك کردەوە و تەنانەت بۆ بەری ڕۆژئاوای دیجلەش پەرییەوە و قەڵەمڕەوی خۆی گەیاندە شنگال و ناوچەکانی خابور لە کوردستانی ڕۆژئاوای ئێستا. هەر لەم کاتانەش دا بووە کە ئەرراپخا و دەشتاییەکانی دەورووبەریی لە ئاشوورییەکان و ئێشنونناییەکان سەندووەتەوە و خستوویەتییە سەر شانشینە خورییە گەورەکەی.[٢٣] نامەیەکی زازیبا دۆزراوەتەوە و لەم ساڵانەی دواییدا بڵاوکراوەتەوە تیایدا بەڵگەی ئەوە تۆمار کراوە کە ناوچەی دەشتی کەرکوك تا دەگاتە دەورووبەری تکریتی ئێستا هەمووی لەژێر ڕکێفی ئەم شانشینە خورییە و زازیبا ی پادشای دا بووە. هەر بۆیەشە دەبینین کەمێك پاشتر کە ئیمپراتۆریی میتاننی دروست دەبێت ئەرراپخا و نوزی دەبنە دووان لە گرنگترین و گەورەترین مەڵبەندە سیاسی و کولتوری و ئابوورییەکانی و بەشی هەرە گەورەی دانیشتووانەکەی دەبنە خوری. لەو نامەیەدا کە زازیبا بۆ مێپتوم ناوێکی ناردووە کە گەورەی شوانکارە بیابانگەڕەکانی ناوچەی ناوەڕاستی فورات بووە و لەم کاتەدا دەستی بە ناوچەی تکریت گەیشتووە و زۆر جار نامەبەرەکانی زازیبای گرتووە کە بۆ لای حەممورابیی هاوپەیمانی زازیبا دەچوون، تیایدا بە مێپتوم دەڵێت: "تۆ و سەروەرت (مەبەستی زیمری -لیم ی پادشای ماری یە کە سەروەری مێپتوم بووە) بەردەوام کاری نابەجێ بەرامبەر من دەکەن. ئێوە ئەو نێردراوانەی منتان گرتووە کە بۆ بابلم ناردوون. ئێستا ئەوەتەی دەشتەکەم لەژێر دەستدایە ڕێگای بابل بۆ ئەرراپخا کراوەیە."[٢٤]

کەواتە لە ڕووی مێژووییەوە دەتوانین بڵێین کەرکوك و ناوچەی گەرمیان لە سەردەمی پاش ڕمانی بنەماڵەی سێیەمی ئورەوە کەوتە دەست سیمورروم کە شانشینێکی خۆماڵیی گەرمیان بووە و زۆر لە خەڵکەکەی خوری بوون. پاش لاواز بوونی و دەرکەوتنی هێزی تر، بە تایبەتی ئامورییەکان کە لەم سەردەمەدا بەهێز بوون، ئێشنوننا دەرکەوت و لەسەردەمی (ئیپیق-ئەدەد)ی دووەمدا ئەرراپخای خستە ژێر دەستییەوە و بێگومان ناوچەکانی خوار ئەرراپخاش لە گەرمیاندا هەر لەژێر دەستی دا بووە ئەگینا نەیدەتوانی بەسەریاندا باز بدات بۆ ئەرراپخا. بەڵگەش لەسەر بوونی قەوارەی ئاموریی تر لە ناوچەکانی خواروی گەرمیاندا هەیە، بە تایبەتی لە شاری مێ-توران (تەل حەدداد یان تلول ئەلسیب). بەڵام پاش دەرکەوتنی شەمشی-ئەدەد و فراوانخوازییەکانی، ئەرراپخای خستووەتە ژێردەستی خۆیەوە. دوور نیە بە ڕێکەوتن نەبووبێت لەگەڵ ئێشنوننا دا، یەکەم لەبەر ئەوەی ئەم دوانە هاوپەیمان بوون و دووەمیش دەبینین لە پاشتریشدا کە ئەو دوو هێزە ڕێکەوتن و پێکەوە کاپرایان داگیر کرد، ڕێکەوتنەکە وابوو کە ئێشنوننا بکشێتەوە و تەنها تاڵانییەکان ببات، شەمشی-ئەدەدیش خاك و وڵاتەکەی بۆ بمێنێتەوە و تاڵانی نەبات. دوور نیە لە ئەرراپخاش ڕێکەوتنێکی هاوشێوەیان نەکردبێت. زۆر گرنگە و جێگای سەرنجە کە شەمشی-ئەدەد لە نامەکەی دا بۆ کو-واری باس لە پەرستگای تێششوپ لە ئەرراپخا دەکات. ئەم خواوەندە خواوەندێکی خوری بوو و خواوەندی با و باران و بروسکە بوو. لەسەردەمێکی وا زووی سەردەمی بابلیی کۆندا لە ئەرراپخا پەرستگای هەبووبێت واتای وایە کە خورییەکان بە ژمارەی زۆر لەسەردەمێکی زۆر زووەوە لە کەرکوك دا بوون و بوونیان تەنها لەگەڵ دروست بوونی ئیمپراتۆریی میتانیدا نەبووە وەك زۆر کەس لایان وایە. پاش مردنی شەمشی-ئەدەد و لاوازکردنی ئیشمێ-داگانی کوڕی لەسەر دەستی زازیبا، تا لە کۆتاییدا، کۆتایی بە بنەماڵەکەی و دەسەڵاتەکەی هێنا، ناوچەی کەرکوك (ئەرراپخا) و دەشتاییەکانی دەورووبەری تا دەگاتە نزیك تکریت کەوتنەوە دەست خورییەکان و بەڵگەی ئەمەش نامەکەی زازیبایە بۆ مێپتوم.

**سەرچاوەکان:**

1- Ahmed، K. M.، The Beginnings of Ancient Kurdistan، Ph.D. Dissertation، Leiden، 2012.
2-Frayne، D. R.، Sargonic and Gutian Periods (2334-2113 BC)، Royal Inscriptions of Mesopotamia- Early Periods، vol. 2، Toronto، 1993.
3-Walker، M. F.، The Tigris Frontier from Sargon to Hammurabi- A Philologic and Historical Synthesis، Ph. D. Dissertation، Yale University، Yale، 1985.
٤- ئەحمەد، کۆزاد محمد، کوردستانی ناوەڕاست لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پ.ز. دا، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٨.
5-De Boer، R.، Amorites in the Early Old Babylonian Period، Ph. D. Dissertation، Leiden، 2014.
6-Lackenbacher، S.، "Les lettres de Buqâqum، "Archives Royales de Mari 26/2، Paris، 1988.
7- Heimpel، W.، Letters to the king of Mari، Winona Lake، 2003.
8- Greengus، S.، Old Babylonian Tablets from Ishchali and Vicinity، Istanbul، 1979.
9-Wu Yuhong، A Political History of Eshnunna، Mari and Assyria، during the early Old Babylonian Period (Fromthe End of Ur III to the death of Šamši-Adad)، Changchun، 1994.
10-Wu Yuhong، Wu Yuhong، "The Treaty betweenShadlash (Sumu-Numhim) and Neribtum (Hammi-dushur)، "Journalof Ancient Civilizations9(1994).
11-Birot، M.، "Les Chroniques "Assyriennes" de Mari، " Mari Annales de Recherches Interdiciplinaires 4، Paris، 1985.
12-Frayne، D. R.، Old Babylonian Period (2003-1595 BC)، Royal Inscriptions of Mesopotamia – Early Periods، Toronto، 1990.
13-Eidem and Læssøe، The Shemshara Tablets، vol. 2، Copenhagen، 2001.
١٤-ئەحمەد، کۆزاد محمد، "شانشینی توروککو لەسەردەمی زازیا دا، ئەزمونی دامەزران و پەلهاویشتنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە مێژووی دێرینی کوردستاندا، " ژین ٤ (٢٠١٢)،
15-Kupper، J.-R.، Lettres royales du temps de Zimri-Lim، Archives Royales de Mari، vol.28، Paris، 1998.
16-Durand، J.-M.، Peuplement et sociétés à l'époque amorrite. (I) les clans bensim'alites، Amurru III، Nomades et sédentaires dans le Proche-Orient ancient، ed. Ch. Nicolle، Paris، 2004.

* **پەراوێزەکان:-**

١- بنەماڵەی سێیەمی ئور ئیمپراتۆرییەك بوو کە دامەزرێنەرانی سومەری بوون، پایتەختەکەیان شاری ئور بوو کە ئێستا بە شوێنەوارەکانی دەووترێت 'المقیر' و لە پارێزگای ناسریەیە. ئەم ئیمپراتۆرییە وڵاتی سومەر و ئەکەدی لەژێر دەستدا بوو و سەرباری ئەوەش بەشێکی زۆری وڵاتانی دراوسێشی داگیر کردبوو یان دەسەڵاتی تیادا هەبوو وەك وڵاتانی عیلام و ئاوان و سیماشکی و زەبشالی و ئەنشان لە ئێرانی ئێستا و ماری لە سوریای ئێستا و چەندین شوێنی تر، هەوڵی زۆریشی دا کە وڵاتەکانی گوتییەکان و لوللوبییەکان و هەولێری کۆن داگیر بکات و چەندەها لەشکرکێشیی کردووەتە سەریان و بۆ ماوەی کورت داگیری کردوون، بەڵام نەیتوانیوە تاکۆتایی دەسەڵاتی تیایاندا سەقامگیر بکات. کۆتایی ئەم بنەماڵەیە لەسەر دەستی هاوپەیمانێتییەك بوو لەنێوان ئامورییەکان و سیماشکییەکان، زۆریش پێدەچێت سیمورریەکانیشیان لەگەڵدا بووبێت.

٢-بۆ زانیاری لەسەر لەشکرکێشییەکانی بنەماڵەی سێیەمی ئور بۆسەر سیمورووم و ناوچەکانی تری گەرمیان بڕوانە:
Ahmed، K. M.، The Beginnings of Ancient Kurdistan، Ph.D. Dissertation، Leiden، 2012، p. 182-196.

3- in MU/Na-ra-am-/E[N.ZU] Ši-mu-ur4-ri-[im†] in Ki-ra-še-ni-we iš11-a-ru ù Ba-ba ÉNSI Ši-mu-ur4-ri-im† Dub-ul ÉNSI A-ra-me† ik-mi-ù، Frayne، D. R.، Sargonic and Gutian Periods (2334-2113 BC)، Royal Inscriptions of Mesopotamia- Early Periods، vol. 2، Toronto، 1993، p. 87 (vii، ii)، cf. also: Walker، M. F.، The Tigris Frontier from Sargon to Hammurabi، A Philologic and Historical Synthesis، Ph. D. Dissertation، Yale University، Yale، 1985، p. 19-20.

٤- بۆ دەقی ئەم نووسینە بڕوانە: ئەحمەد، کۆزاد محمد، کوردستانی ناوەراست لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پ.ز. دا، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل. ١٤٨-١٥٤.

٥- هەردوو زاراوەی بابلیی کۆن و ئاشووریی کۆن زاراوەیەکن کە بۆ وەسف دانی دوو سەردەمی مێژوویی بەکار دێن. واتە دیاری کردنی مێژوو و خەسڵەت و جیاکەرەوەی هونەری (بەواتا فراوانەکەی) یان زمانەوانی یان ئەدەبی یان هەر بەرهەمێکی مرۆیی تر کە لەو سەردەمانەدا بەرهەم هاتبێتن. کاتێك دەڵێین شتێك بابلیی کۆنە یان ئاشووریی کۆنە، بە هیچ شێوەیەك ئەوە ناگەیێنێت کە ئەو شتە بەرهەمی بابلییەکان یان ئاشوورییەکانە و هەرگیز واتای ئەوەش نییە کە لە ڕووی نەژادییەوە بابلی یان ئاشوورییە، بەڵکو بەرهەمی هەر گەلێك یان کۆمەڵە خەڵکێك یان تاکێکە کە لەو سەردەمەدا بەرهەم هاتووە. هەر لەم سۆنگەیەشەوەیە کە بۆ نموونە دەڵێین شوێنەوارەکانی نوزی دەچنە ژێر چەتری سەردەمی ئاشووریی ناوەراست، مەبەست ئەوەیە ڕاستە شارێکی خورییەکان بووە و دەسەڵات لەدەستی ئەواندا بووە و شارەکە و شوێنەوارە ماددی و مەعنەوییەکانی لە هەموو ڕوویەکەوە خوری-میتانین و تەنانەت زیاتر لە سەدەیەك وڵاتی ئاشوور هەرێمێکی ژێر دەستی میتانییەکان بووە، بەڵام هاوسەردەمی ئاشووریی ناوەراستن و ئەو سەردەمە لە باکووری مێسۆپۆتامیادا بە سەردەمی ئاشووریی ناوەراست ناسراوە، بۆیە لەژێر ئەو ناونیشانەدا پۆلێن دەکرێت. ئاشووریی کۆن و بابلیی کۆن هاوچەرخی یەکن و لە ڕووی جوگرافییەوە دابەش کراون.

٦- بۆ ئەمە بڕوانە:
De Boer، R.، Amorites in the Early Old Babylonian Period، Ph. D. Dissertation، Leiden، 2014، p. 157.

٧- بۆ دەقی ئەم نامەیە بڕوانە:
Lackenbacher، S.، "Les lettres de Buqâqum، "Archives Royales de Mari 26/2، Paris، 1988، p. 427-9; Heimpel، W.، Letters to the king of Mari، Winona Lake، 2003، p. 389.

8- بۆ ئەمە بڕوانە: Ahmed، op، cit.، p. 244

9- بۆ ئەم نامانە بڕوانە:De Boer، op. cit.، p. 175

10- Greengus، S.، Old Babylonian Tablets from Ishchali and Vicinity، Istanbul، 1979، 63: 17-19.

١١- ئێستا بە شوێنەوارەکانی دەووترێت تەل حەدداد یان تلول ئەلسیب، چونکە ئەم شوێنەوارە لە سێ گردی تەنیشت یەك پێکهاتووە و تائێستا نەتوانراوە جیابکرێتەوە کامیان مێ-تورانی کۆن بووە.

١٢- ئەو دەقە ڕێکەوتننامەیەکە لەنێوان شادلاش و نێریبتوم دا و کلێشە مێژووییەکەی ئەو زانیارییەی تیادایە، بڕوانە:
Greengus، op. cit.، 74-77، Wu Yuhong، A Political History of Eshnunna، Mari and Assyria، during the early Old Babylonian Period (Fromthe End of Ur III to the death of Šamši-Adad)، Changchun، 1994، p. 54-61; and Wu Yuhong، Wu Yuhong، "The Treaty between-Shadlash (Sumu-Numhim) and Neribtum (Hammi-dushur)، "Journalof Ancient Civilizations9(1994).

13- Frayne، D. R.، Old Babylonian Period (2003-1595 BC)، Royal Inscriptions of Mesopotamia – Early Periods، vol. 4، Toronto، 1990، E4.16.1.

14- Wu Yuhong، A Political History …، p. 52.

١٥- MEC کورتکراوەی Mari Eponymic Chronology یە. بۆ دەقەکەو وەرگێران و بڵاوکردنەوەکەی بڕوانە:

Birot، M.، "Les Chroniques "Assyriennes" de Mari، " Mari Annales de Recherches Interdisciplinaires 4، Paris، 1985، p. 227 ff.

١٦- بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو.

17- De Boer، op. cit.، p. 231.

18- De Boer، op. cit.، p. 233.

بۆ شوێنی خوڕشیتوم و زانیاریی ووردتر لەسەر و بەیەك زانینی لەگەڵ خارشی Ḫarši ی سەردەمی بنەماڵەی سێیەمی ئوردا بروانە:

Ahmed، op. cit.، p. 198; Frayne، Old Babylonian Period، Royal Inscriptions of Mesopotamia – Early Periods، vol. 4، E4.20.1.

19- Eidem and Læssøe، The Shemshara Tablets، vol. 2، Copenhagen، 2001، SH 809، p. 70-71.

٢٠- ٥) m*Ni-ip-ra-am iš-tu* ⸢*ma*⸣*-ḫa-ar* ٦) m*Sa*-am-si-*f*IM il-li-kam-ma 7) um-ma šu-ú-ma #e4-mu-um ma-li mSa-am-si *f*IM i-pu-la-an-ni 8) ma-di-iš!ša ‹a-di-im ùURU† Ar-ra-ap-‹a-am† 9) i%-%a-ba-a[t] ù a-na Qa-ba-ra-e† 10) mSa-am-s[i]-*f*IM i-ta-ši 11) ù ma-ra-šu mIš-me-*f*Da-gan 12)[i]t-ti %a-bi-im 1 šu-ši li-mi 13) a-na Nu-úr-ru-gi-im† la-wi-[i]m 14) iš-ta-pa-ar، Eidem and Læssøe، op. cit.، p. 136-8 (no. 64 = SH 827).

٢١- بۆ نمونە بروانە نامەی SH ٨٨٨ لە هەمان سەرچاوەی پێشوو: Eidem and Læssøe. op. cit.. ٨٤. و SH ٩٢٥+٩٤٢لە هەمان سەرچاوەدا:.Eidem and Læssøe ١١٠.-op. cit.. p. ١١١

٢٢- بۆ ووردەکاریی زۆری ئەم ڕووداوانە و زانیاریی زیاتر و بەڵگە نووسراوەکانی سەریان بڕوانە:

Ahmed. *op. cit.*. p. ٣١٧ff.

٢٣- بۆ زانیاری ووردتر و زیاتر لەسەر زازیا و شانشینەکەی و چۆنییەتی بنیاتنانی بڕوانە: ئەحمەد، کۆزاد محمد، "شانشینی تورووککو لەسەردەمی زازییا دا، هەژمونی دامەزران و پەلهاویشتنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە مێژووی دێرینی کوردستاندا، " ژین ٤ (٢٠١٢)، ل. ٥-٢٦.

24- 7) be-el-ka ù at-ta le-em-ni-iš8) t[a]-ar-#ú-ba e-te-ep-pu-ša-am 9) DU[MU.MEŠši-ip-ri-i]a [š]a °a¿-[n]a [K]Á.DINGIR.RAk-[i] 10) a-ša-a[p-p]a-ru ta-ak-ta-la 11) i-na-an-na KASKAL ša a-na KÁ.DINGIR.RA† i-la-ku 12) a-na Ar-ra-ap-‹i-im† it-te-ep-te 13) iš-tu-ma ka-%a-am i-na i-ni-ia 14) a-ma-ru، Kupper، J.-R.، Lettres royales du temps de Zimri-Lim، Archives Royales de Mari، vol.28، Paris، 1998، p. 260-1; Durand، J.-M.، Peuplement et sociétés à l'époque amorrite. (I) les clans bensim'alites، Amurru III، Nomades et sédentaires dans le Proche-Orient ancient، ed. Ch. Nicolle، Paris، 2004، p. 145.

*** كەركوك و گەرمیان لە سەردەمانی ئەشكانی (پارتی) (دەورووبەری ١٣٥ پ.ز.-٢٢٤ ز.) و ساسانی (٢٢٦-٦٣٧ ز.) دا**

د. كۆزاد محەمەد ئەحمەد
زانكۆی سلێمانی - بەشی شوێنەوار

سەردەمی ئەشكانی كە سەردەمی پارتەكان و فەرمییەكانیشی پێ دەوترێت، سەردەمێكی دوور و درێژ بووە لە مێژووی ناوچەكەدا، لە رووی مێژوویی و فەرهەنگیشەوە زۆر گرنگ بووە و شوێنەوارێكی زۆری لەدوای خۆی جێهێشتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر كەم بایەخی پێدراوە و لەسەری نووسراوە یان كۆڵراوەتەوە. هەڵبەت ئێرە جێگای باسكردنی هۆكارەكانی ئەم دیاردەیە نییە، بەڵكو ئامانج لەم كورتە باسە نووسینەوەی ئەوەی لە بارودۆخی ناوچەی كەركوك و گەرمیانە لەو سەردەمە گرنگەدا زانراوە. جێگای سەرنجە كە ئەم كورتە باسە رووداوی مێژوویی كەمی تێدایە و زیاتر لەسەر جوگرافیای مێژوویی ناوچەكە دەڕوات ئەویش بەهۆی زانیاریی كەم كە لەبەردەست دایە لەو بارەیەوە و بەشی زۆری ئەوەی كە هەیە ئەو زانیارییە جوگرافییانەن كە مێژوونووس و جوگرافیناسە كۆنەكان بۆمانیان تۆمار كردووە، بە تایبەتی كلاسیكییەكان (یۆنان و رۆمان) و سریانەكان.

پاش مردنی ئەسكەندەری گەورە لە بابل لە ٣٢٣ پ.ز. دا، ناكۆكی و ململانێیەكی توند بەرۆكی فەرماندە گەورەكانی سوپاكەی و گەورە پیاوانی دەوڵەتەكەیی گرت. پاش چل و دوو ساڵێك لەم ناكۆكییە، لەسەر ئەوە رێكەوتن كە میراتەكەی ئەسكەندەر لەنێو خۆیاندا بەش بكەن. مێسۆپۆتامیا و خاكی وڵاتەكانی ئێران و ئەفغانستان و سوریا و لوبنانی ئێستا و بەشێكی زۆری ئەنەدۆڵ بەر سلۆكسSeleucusكەوتن، كە بەشە هەرە گەورەكە بوو. ئەم خاكە بەرینە بووە دەوڵەتێكی گەورە بە ناوی دەوڵەتی سلوكییەكان.

سەرچاوە كۆنەكان ئاماژە بەوە دەكەن كە سلۆكس چەند خانەوادەیەكی خانەدانی لە شاری (ستەخر) ی هەرێمی فارسەوە هێناوەتە شاری كەركا كە ناوی كەركوكە لەو كاتەدا، و لەوێ نیشتەجێی كردوون[1].

هەرچەندە سلۆكس خۆی زۆری حەزی بە رۆژهەڵات بوو و گرنگیی پێدەدا و پایتەختێكیشی لە شاری سلوكییە (ئێستا بە شوێنەوارەكانی دەوترێت تەل عومەر لە نزیك سەلمان پاك) بوو، بەڵام ئەوانەی پاش خۆی هاتن روویان كردەوە رۆژئاوا و پایتەختیان بردە شاری ئەنتاكیە Antiochی سەر ئۆرۆنتوس (رووباری عاسی) لە سوریای ئێستا. ئەم پشت گوێ خستنەی هەرێمەكانی رۆژهەڵات لەگەڵ ویست و ئارەزووی ئەشكانییەكاندا یەكی گرتەوە كە دەیانویست دەستەڵاتی سلوكییەكان بنبڕ بكەن و خۆیان دەستەڵات بگرنە دەست.

هەر لە ساڵی (٢٤٧ یان ٢٣٨ پ.ز)[2] هوە فەرمانڕەوا سلوكییەكەی هەرێمی باكتریا یان دەركرد و بناغەی دەوڵەتی ئەشكانییان دانا[3]. پاش چەندین ساڵ شەڕ و شۆڕ و ململانێ، كە تیایدا وورده وورده لە قەڵەمڕەوی سلوكییەكانیان دەپچڕی و دەیانخستە سەر قەڵەمڕەوی خۆیان. روون نییە ئەشكانییەكان كەی گەیشتوونەتە مێدیا. بەڵام كۆنترین بەڵگەنامەی ئەشكانی لە وڵاتی بابل مێژووەكەی بۆ ١٤١ پ.ز. دەگەڕێتەوە و مێژوونووس جوستین Justin نووسیوێتی كە میپراداتیس چەندین شەڕی لە میدیادا لە دژی سلوكییەكان كردووە تا گرتوویەتی. بوونی نووسینە یۆنانییەكەی بێستونیش لەسەر پەیكەرەكەی هیراكلیس (هرقل) كە ناوی كلیۆمێنێس Cleomenes ی وەك ساتراپی "هەرێمەكانی سەروو" تۆماركردووە و مێژووەكەی بۆ ١٤٩-١٤٨ پ.ز. دەگەڕێتەوە، دەبێت ئەوەی لێ تێبگەین كە لە پێش گرتنی وڵاتی بابلەوە ٧-٨ ساڵێك هەبووە كە تیایدا لە میدیاوە توانراوە بگەنە وڵاتی بابل.[4] ئەمە واتای وایە كە گرتنی میدیا پێدەچێت لە دەورووبەری ١٣٤-١٣٥ پ.ز. دا تەواو بووبێت و چەسپابێت، كەوتنە ژێر ركێفی گەرمیان و كەركوكیش هەر دەبێت لەنێوان گرتنی میدیا و بابل دا بووبێت، بە رای نووسەریش لە مێژووی گرتنی بابلەوە نزیكتر بووە.

بەمانە ئەشكانییەكان كۆتاییان بە دەستەڵاتی سلوكی هێنا و پایتەختیان هێنایە تەیسەفون كە هەر بە تەنیشت سلوكییەوە بوو. بەمشێوەیە كەركوك و ناوچەی گەرمیان لە ساڵانی نێوان ١٤١-١٣٥ پ.ز. دا بوونەتە بەشێك لە قەڵەمڕەوی ئەشكانییەكان.

جێگای داخە كە ئەشكانییەكان نزیك لە هیچ سەرچاوەی نووسراویان بەجێنەهێشتووە. ئەوەی لە بارەیانەوە دەیزانین، یان لەڕێی نووسراوە كورت و دووبارەكانی سەر سكەكانیانە كە پادشایانیان لێیان دەدا، یان هەندێك دەقی ئابووریی كورتی سەر پارچە سواڵەتن، [5]یان سەرچاوە كلاسیكییەكانی یۆنان و رۆمان باسیان كردووە، ئەویش بەبۆنەی شەڕ و ململانێ سەخت و درێژخایەنەكانی ئەشكانییەكان و رۆمانەكانەوە نووسراون و تۆمار كراون. لە نێو ئەو سەرچاوە كلاسیكییانەدا پلینی Pliny و پەتلیموس Ptolemyباسێكیان لە گەرمیان كردووە. خۆشبەختانە چەند نووسراوێكی سریانی هەن كە مێژووی شاری كەركوكیان باس كردووە و بەدەست گەیشتوون. لەو نووسراوانەدا كە باس لە بنەچەی شارەكە و بنیاتنانی دەكەن، هەرچەندە لەوەدا هەڵەن، بە تایبەتی ئەو دەستنووسەی كە بە "هەواڵنامەی كەرخ بێت سلۆخ"[6] ناسراوە، كە مێژووی دروستكردنی بۆ سەردەمی ئاشورییەكان دەگێڕنەوە و داویانەتە پاڵ دوو پادشای ئاشوری كە بە سارگۆن و ئەسەرحەددون لێك دراونەتەوە، بەڵام هەندێك زانیاریی گرنگیان لەسەر سەردەمانی دواتر تێدایە. لێرەدا، پێش ئەوەی بچینە سەر باسی سەردەمی ئەشكانییەكان كە زۆر كەم لەبارەی رووداوە مێژووییەكانی كەركوك و گەرمیان لە سەردەمی ئەواندا دەزانین، ئاماژەیەك بۆ نەخشە و پێكهاتەی ناوەوەی شارەی كەركوك لەسەردەمی سلوكییەكاندا دەكەین كە لەو دەستنووسانەدا هاتووە، لەبەر ئەوەی كە ئەوەی لەو

سەردەمەدا بنیات نراوە، هەر دەبێت تا ماوەیەکی زۆر لە سەردەمی ئەشکانیشدا هەر مابێت و بەو جۆرە بووبێت.

بە ووتەی دەستنووسەکە بنیاتنانی شورای گەورەی دەوری شار لەسەردەمی سلۆکس دا بووە، پاش ئەوەی شورا کۆنەکە کە وێران بووە، ئەم لە مەودایەکی تردا بنیات نراوە. ئەم شورایە ٦٥ بورجی هەبووە و شاری کردووەتە قەڵایەکی مەحکەم. دوو دەروازە لە شوراکەدا هەبوون، یەکێکیان لە باشووری رۆژهەڵات و ئەوی تریان لە باکووری رۆژئاوا. بەوەی یەکەمیان دەووترا دەروازەی شاهانە. لە تەنیشت دەروازەکەوە پەیکەرێکی بەردینی زۆر گەورە دانرابوو. لەم لا و لای هەر دەروازەیەکیشەوە دوو بورجی لە بەرد و قسڵ بنیات نراو هەبوون، یان بورجی لە بەرد بنیات نراو کە بە قسڵ سیواغ درابوون.[7] کۆشکی شاهانە لە ناوەراستی شاردا بوو و مایەی جوانی و دڵرفێنیی شارەکە بوو. لە پاشتردا، هەر لەسەردەمی سلۆکس دا، لە ناو قەڵاکەدا بورجی چاودێری بنیات نراون. شار ئاوەدان بووە و گەورە بوو. نەك تەنها ناو شارەکە، بەڵکو دەرەوەیشی بووە شارێکی جوان و رازاوە. لە ناو دیوارەکانی قەڵاکەدا چەندین کۆشك و خانوو و جادە و کۆڵان بنیات نران و لێدران. شارەکە ٧٢ جادە و کۆڵانی هەبوو. هەندێك خەڵکیان لە شوێنانی تری دەورووبەرەوە هێناوەتە شارەکە و نیشتەجێیان کردوون، بەڵام هەشبوون لە شوێنی دوورەوە هێنراون. بەشێك لەوانەی هێنرانە شار و نیشتەجێ کران پێنج خانەوادە لە خانەدانە گەورەکانی ئێران لە شاری ئیستەخر بوون کە لە شارەکە زەوییان پێدرا و نیشتەجێ کران. خەڵکی شارەکە لەلایەن سلۆکسەوە لە باج و سەرانە بوردران.[8] ئەوانەی هاتنە شارەکە و نیشتەجێ کران، لە کۆشك و خانووی گەورە دا نیشتەجێ بوون و بوونە خاوەنی زەوی و باخ و بێستانی زۆر و زەبەند. لەو ٧٢ جادە و کۆڵانانەی شار دوانزدەیان بە ناوی دوانزدە خانەوادەی ناودارەوە ناونران کە لەو کۆڵان و جادانەدا نیشتەجێ بوون. جادەکانی تر بە ناوی پیشەگەرانەوە ناونران کە لە شوێنی جیاجیاوە هاتبوونە شارە کە و بەپێی پیشە و کاریان لە جادە و کۆڵانەکاندا نیشتەجێ کران. بەم جۆرە، هەواڵنامەکە وێنایەکی تەواوی نەخشەی شار و دابەشکردنی گەرەکەکان و کۆشك و قەڵا و شورا و بورجەکانی کێشاوە. دەریشی دەخات کە شار کرابووە دووبەشی سەرەکییەوە، بەشی خانەدانەکان و بەشی پیشەگەران و خاوەن کارەکان. بۆ دەستپێکی ژیانێکی نوێ پاش کۆچ هێنانیان بۆشار، خانەدانەکان زەوییان پێ دراوە و خاوەن کار و پیشەگەرانیش تا ماوەیەك لە باج و سەرانە بوردراون.[9] وا دیارە ئەم تازە کردنەوە و فراوان کردن و ئاوەدان کردنەوەیەی لە سەر دەستی سلۆکس ئەنجام دراوە بووەتە هۆی ئەوەی شارەکە ناوی ئەوی بەسەردا ببڕێت (کەرخ بێث سلۆخ/سلۆك) کە واتای قەڵای بنەماڵەی سلۆکس دەبەخشێت.

بێینەوە سەر سەرچاوە کلاسیکییەکان، پلینی کە کتێبەکەی باسی جوگرافیای جیهانی کۆن دەکات، ناوی ئەو هەرێمانەی بردووە کە ئیمپراتۆریی ئەشکانییان پێکدەهێنا.[10] بە ووتەی ئەو ئیمپراتۆریی ئەشکانی لە هەژدە شانشین پێکدەهات (کتێبی شەشەم، ١١٢ ١١٢ .VI)، پانزدەیان شانشینەکانی "سەروو" و حەوتیان شانشینەکانی "خواروو" بوون. ناوچەی گەرمیانی ئێستاش بە زمانی پەهلەویی ئەشکانیی ئەو سەردەمە هەر پێی دەووترا "گەرمیکان Garmikān" و بە ئارامیش "بێث گەرمای bēth Garmai" بوو. پەتلیمۆس ناوی ئاررپخا (کەرکوکی کۆن) ی بە شێوەی (ئەرراپاخیتیس Arrapachitis) نووسیوە و گەرمیانیش بە (گەرەمایۆی Garamaioi).[11] شانشینێك بوو پایتەختەکەی "کەرخا د بێث سلۆك Karkha de bēth Slōk" بوو کە کەرکوکە. ئەم شانشینە تا هاتنی ساسانییەکان هەر بەردەوام بوو. بە ووتەی فرەی ئەو کاتە ئیتر یان خراوەتە سەر شانشینی ئاسوریستان (ناوەراستی مێسۆپۆتامیا) یان ئەدیابینە لە باکوور.[12]

جوگرافیناسی رۆمانی ئیسیدۆریسی کەرخی Isídorus of Charaxکە وا پێ دەچێت ئیمپراتۆری رۆمانی ئۆگوستوس بۆ شارەزابوون و بەرچاو روونیی خۆیان لە قەڵەمرەوی ئەشکانییەکانی نەیاریان ناردبێتیانە قەڵەمرەوی ئەشکانییەکانەوە، کتێبێکی لە بارەی جوگرافیا و رێگاوبانەکانی ئەو وڵاتەوە نووسیوە کە بەداخەوە بەشی زۆری فەوتاوە و بەشێکی ماوەتەوە کە باس لە بەشێکی ئەو قەڵەمرەوە دەکات. لەوانەی باسی کردوون وڵاتی ئەپۆلۆنیاتیس Apolloniatis ە کە بەپێی وەسفەکەی ئەو دەکاتە بەشی خوارووی گەرمیان. بەڵام بە رای هەندێکی تر هەموو گەرمیان بووە، لە باشووری هەولێرەوە تا بەغدا.[13] راستییەکەی، ئەم ناوە لەلایەن جوگرافیناسانی یۆنانیی مەکەدۆنییەوە لەم وڵاتە نراوە و بە ووتەی ستراب‌ۆ (p. ٧٣٢ and ٥٢٤) ناوە کۆنەکەی سیتتاکێنە Sittacene بووە.[14] ستراب‌ۆ نووسیویەتی کە سیتتاکێ شارێك بووە (xvi. p. ٧٤٤) لەسەر رێگای نێوان ئەرتەمیتا و سوسە (شوش). دیۆدۆروس بە شێوەی سیتتا Sitta (xvii. ١١٠) تۆماری کردووە. بە ووتەی ستراب‌ۆ سیتتاکێ پایتەختی سیتتاکێنە بووە کە لە پاشدا ناوەکەی بووە بە ئەپۆلۆنیاتیس (xi. p. ٥٢٤). بە ووتەی پۆلیبیوس(٤٤ .V)، هەرێمی ئەپۆلۆنیاتیس و وڵاتی بابل سنووری باشووری وڵاتی میدیایان پێکدەهێنا، بۆیە ئەم هەرێمە رۆژهەڵاتی دیجلەی دەگرتەوە، ئەو راستییەی کە پۆلیبیۆس لە شوێنێکی تریشدا (٥١ .V) جەختی لەسەر کردووەتەوە. جێگای سەرنجە کە پلینی دەڵێت گوایە ئەم شارە بە (ئەربێلیتیس Arbelitis) و (پالایستینە Palaestine) یش ناوزەد کراوە و بەلای ئەوەوە شوێنەکەی لە سەرووتر بووە.[15] سمیث لای وایە سیتتاکێ هەمان ئەو هەرێمە بێت کە کورتیوس Curtius پێی دەڵێت ساتراپێنە Satrapene.[16] بە ووتەی ئیسیدۆریس پانتایی ئەپۆلۆنیاتیس ٣٣ پەرسەنگ[17] بووە و چەندین ئاوەدانی و مەنزڵگای سەر رێگای هەبووە، گرنگترین شاریشی ئەرتەمیتا Artamita بووە کە لە سەردەمی ئەودا خالاسارChalasar ی پێ ووتراوە و رووباری سیلاSilla بە ناوەراستی دا تێپەریوە. دووریی ئەرتەمیتا لە شاری سلوکیەوە ١٥ پەرسەنگ بووە. شاری ئەرتەمیتا بە یەکێك لە شارە گرنگەکانی سەردەمی

ئەشکانی لەقەڵەم دەدرێت و شوێنەکەی بە دڵنیاییەوە دەستنیشان نەکراوە، مامۆستا فوئاد سەفەر بە شوێنێکی نزیك بەعقوبەی دەزانێت، [١٨] بەڵام سمیث بە شارەبانی ئێستای دەزانێت.[١٩] ڕووباری سیللا لەسەر زمانی نووسەرە کلاسیکییەکان بە ڕووباری دیالە–سیروان ووتراوە.

سترابۆ لە کتێبەکەیدا باسی لە ناوچەی کەرکوك و گەرمیانی وا کردووە کە وەك هەرێم، دەکەوێتە باشووری ڕووباری کاپرۆسKapros[٢٠]ەوە. بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "ئەو هەرێمە پێی دەوترا ئەرتەکێنی Artakene..... پاشان دەگەیتە کانییەکانی نەفتا و ئاگرەکان، ئەمجا پەرستگای ئانێیا Anea و (شاری) سادراکای، ئەمجا کۆشکی شاهانەی داریوشی کوڕی هیستاسپیس (گوشتاسپ)، ئەمجا کیپاریسسۆن (یان ڕاستتر: کوپاریسسۆن) ئەمجا لە ڕووباری کاپرۆس (؟) پەڕینەوە و لە کۆتاییدا نزیك سلوکیا و بابل دەبێتەوە."[٢١]

بەڕای مارکوارت لەپێش سەردەمی ساسانیدا، واتە لەسەردەمی ئەشکانی دا، لە گەرمیان دوو خانەوادە دەستەڵاتدار بوون، ئەوانیش بنەماڵەی (بەرزین) و بنەماڵەی (یەزدین) لەو بڕوایەشدایە کە بنەماڵەی یەزدین لە نەوەی بنەماڵەی (ئیزات)ی پادشای ئەدیابینە بووە.[٢٢]

شوێنەواری گۆڕێکی ئەم سەردەمە، کە لە جۆری گۆڕە گەورە و تێروتەسەلەکانی ئەو سەردەمەیە، لە سەرقەڵای گەرمیان دۆزراوەتەوە و دەریدەخات کە ئەو ناوچەیە لەسەردەمی ئەشکانییەکاندا جێگای بنەماڵەیەکی دەستەڵاتدار و لەوانەشە خاوەن دەسەڵاتی سیاسیی ناوچەکە بووبێت، بە تایبەتی کە دۆزراوەکانی ناو گۆڕەکە کە لە ٢٠١٣ دا دۆزرایەوە، دەوڵەمەندی و دەست ڕۆیشتوویی و پلەی کۆمەڵایەتیی باڵای خاوەنەکەی دەردەخات.[٢٣] دوور نیە پەیوەندیی بە یەکێك لەو دوو بنەماڵەیەوە نەبێت کە مارکوارت ناوی بردوون. ئەمە لە هەمان کاتیشدا ئاماژەیەکی گرنگە بۆ بوونی ئاوەدانییەکی گەورە و گرنگ لە نزیك یان هەر لە شوێنی ئەم گۆڕە کە ڕەنگ بێت یەکێك لەو شار و ئاوەدانییانە بێت کە نووسەرانی یۆنان و ڕۆمان تۆماریان کردووە و لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ کردوون.

باسی کەرکوك و گەرمیان لە نووسراوە مێژووییەکانی سریانەکانیشدا هاتووە کە زۆریان لەسەردەمی ساسانی دا نووسراون. بەپێی ئەو نووسراوانە هەرێمی گەرمای لە ڕۆژگارە کۆنەکاندا "وڵاتی پادشایەتیی گەرمای"ی پێ دەووترا کە لە زێی خوارووەوە تا (دێکلات =دیجلە) و تا ڕووباری (ئەترەکۆن Ätrakon) درێژ دەبووەوە. ئەم ڕووبارەی دواییان بە ناوی تۆرمار Tormar یان تامارڕا Tamarra بە ناوبانگ بوو.[٢٤] ناوی بەرزاییەکانی ئوروکو یان ئورێکۆن یش هاتووە کە پێدەچێت زنجیرەی حەمرین بن.[٢٥] سنووری ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژهەڵاتی هەرێمەکەش خاکی لادب و چیای شیران بووە.[٢٦] هەر بەپێی سەرچاوە سریانییەکان، لە شارە گرنگەکانی ئەم هەرێمە، جگە لە کەرکوك خۆی کە ئەوسا کەرخ د بێث سلۆخ (یان: سلۆك)ی پێ دەووترا، شەهرکەرد و دەکوك (یان: تاکوك Takouk) و لاشۆم بوون. دەرئاباد یش شارێکی گەرمیان بووە کە هەندێك بە شارێکی هەرێمی شارەزووریان داناوە نەك گەرمیان. ئەمانە جگە لە چەند شارێکی تریش کە شوێنەکانیان دەست نیشان نەکراون،[٢٧] وەك کەرخ جوددان و (ئەریوان Arîwân) یان (ئەریاڤان Ariavân) (کە پێدەچێت لەسەر زێی خواروو بووبێت[٢٨])و تەحال Taḥal و بێث سرایBēt$^{h}$ Srāi و پێرۆزئاباد Perōzāb$^{h}$ād$^{h}$و وێستگەی نیکاتۆر Nīqatōrو کۆمەڵێك گوند، وەك حاشا Ḥašāلەسەر ڕۆخی زێی خواروو، کەفرا لە ڕوستاقی بێثگواجا Bēt$^{h}$ Gwājā کە زۆر پێدەچێت کفری بێت و ناوچەکەی ئەوسا پێ ووترابێت ناوچەی گواجا.[٢٩]

دەکوك هەر داقوقە کە لە چەند شێوەیەك ناوەکەی نووسراوە. هۆفمان دەڵێت تاوق ڕاست نییە و شێوە ڕاستە کۆنەکەی هەر داکوکە.[٣٠] لاشۆم کە بارەگای ئەسقەفیشی لێ بووە لەگەڵ گوندی لاسیمە*ی ئێستادا بەیەك دەزانرێن، هەرچەندە هۆفمان ئاماژە بۆ نووسینێکی عەمر بار مەتتای دەکات کە نووسیوێتی "لاشۆم کە داقوقە" و "لاشۆم واتا داقوق، " واتە لاشۆمی هەر بە داقوق داناوە،[٣١] بەڵام ئەمە بەڕای ئێمە دەبێت هەر لەوەوە هاتبێت کە تاوق گەورەتر و بەناوبانگ تر بووە بۆیە سێبەری بەسەر لاسیمە – لاشۆمیشدا کێشاوە. بەڵام جێگای سەرنجە کە ئیلیای دیمەشقی لاشۆمی لە خانیجار داناوە کە بەپێی سەرچاوە جوگرافییە عەرەبییەکان لە دووز خورماتوو بووە.[٣٢] لاشۆم مەڵبەندێکی زۆر گرنگی ئایینی دیان بووە و گەلێك کەسی بەناوبانگی ئەو ئایینە یان لەوێ لەدایك بوون، یان لەوێ خزمەتیان کردووە.[٣٣]

شاری شەهرکەرد[٣٤]کە بەپێی سەرچاوە کۆنەکان بە زۆر و زەبەندیی دار هەنجیر ناوبانگی دەرکردووە،[٣٥]لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی کەرکوك بووە و وەك هەندێك جوگرافیناسی کۆن وەسفی دەدەن، دەڵێن لە ڕێگای نێوان داقوق و هەولێر دا بووە.شارێکی گرنگی ناوچەی کەرکوك و گەرمیان بووە و بە ڕای مامۆستا تۆفیق وەهبی لە ڕۆژهەڵاتی کەرکوك بووە.

پێرۆزئاباد شارێکی تر بووە و ناوی وا هاتووە کە شوێنی لەدایك بوونی (مار سەبریشۆع Mâr Sabhrîshôʿ) ی ئەسقەفی لاشۆم بووە و هەر لە گەرمیان بووە.شاری (غاوکای Ghâwkai) نزیك یان لەسەر زێی بچووك بووە و سەر بە گەرمیان بووە.[٣٦] گوندی (لوز Lûz) یش وەك گوندێکی گەرمیان کە لەسەر زێ بووە، تۆمار کراوە.[٣٧] ناوچەکانی (ڕێشا Rêshâ)[٣٨]و (بێث گاوایا Bêth Gâwâyâ)[٣٩]و (بێث مێشایناندێ Bêth Mêshainânê) (ئەمیان لەسەر زێی بچووك بووە)[٤٠] لە گەرمیان ناویان هاتووە. هەرچەندە هەندێك لەم ناوانە ناوی ئارامین، پێدەچێت وەرگێڕانی ناوە ڕەسەنەکانی ئەو شوێنانە بووبن، لەوانەشە ئەو شوێنانە دوو ناویان هەبووبێت، ناوێکی ڕەسەن بە زمانی دانیشتووانەکەی و ناوێکی ئارامی کە سریانەکان لێیان نابێت.

لەکۆتایی سەردەمی ئەشکانییەکاندا ئەردەشیری ساسانی پەیدا دەبێت و لە دژی دوایین پادشای ئەشکانی، ئەردەوانی پێنجەم، دەکەوێتە شەڕەوە. ئەردەشیر هاوپەیمانییەك بۆ ئەم مەبەستە پێك دەهێنێت و بەپێی کتێبی "هەوالنامەی ئەربێلا،

" هەرچەندە کتێبێکە کە ئێستا قسەی زۆری لەسەرە کە هەڵبەستراوی سەردەمێکی نوێ بێت، ئەو کتێبە دەڵێت گوایە پادشایانی ئەدیابینە (هەرێمی هەولێر) و کەرکوکیش نەچنە هاوپەیمانێتییەکەوە لە دژی ئەردەوان. شەهرەت Šahrat ی پادشای ئەدیابینە (کە لە کتێبەکەدا بە حدیاب نووسراوە) و دۆمیتانا Domytana ی پادشای کەرخ سلۆخ (واتە کەرکوك) هێزەکانیان یەك خست و لە بەهاردا شاڵاوێکی توند دەکەنە سەر ئاشکانییەکان و گەمارۆیان دەدەن و بە یەکجارەکی کۆتایی بە فەرمانرەوایەتییەکەیان دەهێنن.[٤١]

بەپێی سەرچاوە کۆنەکان کەرکوك، وەك هەولێر مەڵبەندی نیشتەجێبوونی ئەسقەفی نەستوری بوون.[٤٢] لە بەڵگەنامەیەکی سینۆدی ساڵی ٤١٠ ز. دا ناوی شەش هەرێمە کلاسیکییەکەی کە ئایینی مەسیحی لە قەڵەمرەوی ساسانیدا بەسەردا دابەش کرابوو، هاتوون و لەگەڵ ناوی هەرێمەکان، پایتەختەکانیشیان واتە بارەگای ئەسقەفەکانیان، نووسراون. یەکێك لەوانە (بێت گەرمای) یە کە کەرکوك پایتەختی بووە.[٤٣] هەروەها کە مانی پەیدا دەبێت و رەوتە ئایینییەکەی بڵاودەکاتەوە، کەسی بە توانا و لێهاتوو بە چەندین شوێنی قەڵەمرەوی ساسانیدا بڵاودەکاتەوە بەمەبەستی بڵاوکردنەوە و گەیاندنی پەیامەکەی و راکێشانی خەڵك بۆ سەر رەوتەکەیان. یەکێك لەو شوێنانە بێت گەرمای بووە. ئەوەبوو لە ساڵانی ٢٦١-٢٦٢ ز. دا ئەددای Addai ناوێك سەرکردایەتی نێردراوێکی لەو جۆرە بۆ کەرکوك دەکات و ئەبدەکیا Abddakyā ناوێك یاریدەدەری دەبێت.[٤٤] لە نووسراوەکانی کە بە کارەکانی شەهیدە دیانەکان ناسراون خراپ باسی ئەم کارەی ئەددای و یاریدەدەرەکەی کراوە و بۆ نموونە دەڵێت: "لە سەردەمانی پادشا بەولاشەوە تا بیستهەمین ساڵی شاپوری کوری ئەردەشیر کە دەکاتە نەوەد ساڵ، (کەرخا =واتە کەرخا د بێث سلۆخ)، خاکێکی پاکیز و بێگەرد بوو، گیاکەڵەی تیادا نەبوو. بەڵام لە سەردەمی شاپووردا، مانی، جامی شۆفاران، زراوی شەیتانانەیی هەلرشتە دەرەوە و دوو گیاکەڵەی بەرەڵڵا کرد، ئەوانیش ئەددای و ئەبداکیا بوون."[٤٥] ئەمەش بەڵگەیەکی ترە بۆ بوونی نێردراوێکی لەو جۆرە و چالاکییان لە کەرکوکدا. لە نوسراوێکی سەر پێستە دا کە لە دەورووبەری شاری (ئامەد =دیاربەکر) دەست کەوتووەو ئێستا لە ئەنتیکەخانەی بەرلینە و رۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ بێجان Bedjan بڵاوی کردووەتەوە، باس لە دوو خانەوادە هاتوون کە خەڵکی کەرکوك بوون و بە شۆفار و پیاو خراپ باس کراون، وا دیارە لەبەر ئەوەی لەسەر بیروباوەریان مانەوی بوون، چونکە دەقەکە تایبەتە بە ریشەکێش کردنی مانەوییەکان. ناوی دوو خانەوادەکە پارێن Paren و بەلاش Balaš ن. دەقەکە بە دوو خانەوادەکە دەڵێت "خانەوادەکانی شۆفاری" و "بەلاش، گیانداری شۆفاری کەرکوك" و "پارێن کوری ئامایك Amaik."[٤٦]

هەر لەو سەرچاوە سریانیانەدا باسی (ئەکبالاها Akbalaha) ناوێك کراوە کە لە سەدەی چوارەمی زایینیدا یەکێك لە دانیشتووانی کەرکوك بووە و لە سەردەمی پادشای ساسانی بەهرام (٣٨٨-٣٩٩ ز.) دا ژیاوە. ئەم کەسە دیان بووە و کوری یەکێك لە خانەدانەکانی شار بووە و باوکی ناوی خەسرەوان بووە، لە دەرباری شاهەنشادا کاری کردووە. دەستنووسەکە ئەوە دەگێڕێتەوە کە گوایە ئەم ئەکبالاهایە کاتێك کە باوکی هێشتا لە ژیاندا بووە بە نهێنی جلوبەرگ و زێر و زیوی بە بێنەوایان و بێ کەسان داوە و کۆمەکی کردوون. پاش مردنی باوکیشی کە موڵك و ماڵەکەیی بە میراتی بۆ دەمێنێتەوە، چەندین کەلوپەلی گرانبەها پێشکەش بە کڵێسا دەکات، لەوانە "زێر و دارشتەی زیو و ئاوریشم و دەفری جوانی گرانبەها."[٤٧] لەنێو میراتییەکانی تری باوکیدا پێنج یەکی گوندێك بوو بە ناوی (نەوەد) بۆیە گوندەکە (خەسرەوان)یشی پێ دەووترا. بە ووتەی دەستنووسەکە بۆیە ناوی نەوەد لەو گوندە نراوە چونکە کاتی خۆی شاپوری دووەمی پادشای ساسانی ٩٠ خێزانی لە مێشانەوە بۆ شارەکە هێناوە و نیشتەجێی کردوون. واتای ئەمە وایە کە لە سەردەمی ساسانیشدا خەڵکیان بۆ شارەکە هەر هێناوە.[٤٨] جێگای سەرنجە کە دەستنووسەکە ئاماژە بە هێنانی بتی خواوەندەکەیان لەگەڵ خۆیان دەکات و دەڵێت: "ئەهریمەنێکیان بە ناوی نانای دەپەرست و رووی نانای یان لە وڵاتی خۆیانەوە لەگەڵ خۆیاندا هێنا."[٤٩]

ئەسقەفێکی تری ناوچەی کەرکوك ناوی (شاپور بەراز Šapubaraz) یان (شاپور بورز Šapuburz) بوو، کە لە هەندێك سەرچاوەی تردا بە (ڤەراز شاپور Varaz Šapur) نووسراوە. مار شاپور بەراز لە خانەوادە گەورە و دەوڵەمەندەکانی شار بووە و دەووترێت کە "خانەوادەکەی هەمان ئەوەیە کە دەووترێت لە خانەدان ئەردەشیری کوری شاپور بەرازە"[٥٠] ئەوەی کە لەسەرەوە باس کرا و هەر لە هەمان ئەو خانەوادانە بوون کە لە ئیستەخرەوە هێنرابوون. خانەوادەیەکی زۆر دەوڵەمەند بوون و بەوە دەوڵەمەند بوبوون کە هەر کەسێك لە خێزانەکەیان چووبوونە سەر ئایینی دیان، بە ویستی خۆیان هەموو یان بەشێك لە موڵك و ماڵیان دابووە دەست شاپور بەراز. ئەویش خانێکی بۆ میوان و رێبواران بە پارەی خۆی بنیات نابوو کە تیایدا کرێی پزیشك و دەرمان و چارەسەری و خزمەتکردنی نەخۆشان لە پارەی ئەو دەدران[٥١].

گەرمیان و گەرمیانییەکان لە میانەی رووداوەکانی نێوان نارسەی کوری شاپوری یەکەم و بەهرامی سێیەمی ساسانی دا ناویان هاتووە. بە ووتەی نارسە بەهرامی سێیەم بەبێ پرس و رای گەورەپیاوان و خانەدانەکانی ساسانییەکان دانراوە و لەم کارەشدا وەهنام ناوێکی کوری تەتروس یاریدەدەری بووە. نارسە دەڵێت گوایە وەهنام ووتوویەتی توانای ئەوەی هەیە گەورەپیاوان و پیاوماقوڵان بکوژێت و ماڵ و موڵکیان بداتە (گەرەماییەکان =واتە گەرمیانییەکان)، پاشان ماڵاتی خۆی لە هی خانەوادەی خۆی و لە هیی گەرەماییەکان پێکەوە بنێت.[٥٢] دیارە مەبەستی لەو گەورە پیاو و پیاوماقوڵانە بووە کە دژی دانانی بەهرام بوون لەسەر تەختی پادشایەتی. دیاریش نییە بۆچی موڵك و ماڵی لێ بەجێماویان دەداتە گەرمیانییەکان، ئایا لە دانانی بەهرام

لەسەر تەخت پاڵپشت و یاریدەدەری بوون؟ ئەمە ناتوانرێت ئێستا بزانرێت، بەڵام ئەوە دەزانین کە کاتێك نارسە لەلایەن گەورەپیاوان و خانەدانەکانی ئیمپراتۆریی ساسانییەوە داوای لێکرا لە ئەرمەنستانەوە بێیتەوە و ببێتە شاهەنشای ساسانییەکان، خەڵکانی چەندین شار و ناوچە و وڵات پشتگیریی نارسەیان کرد و هەندێکی تریشیان هەر بە لایەنگیری بەهرامی سێیەم مانەوە. گەرمیانییەکان یەکێك بوون لەوانەی دایانە پاڵ نارسە. هەڵبەتە ووردەکاریی ئەو ڕووداوانە زۆرن و دوور و درێژن، لێرەدا مەودای باسکردنی هەموویان نییە.[٥٣] بەڵام ئەوەندە پەیوەندیی بە باسەکەمانەوە هەیە کە بەشێك لە ڕووداوەکانی ئەو شەڕ و هەڵایەی نێوان نارسە و بەهرام لە گەرمیاندا ڕوویان داوە و گەرمیان ڕێگای هاتووچۆی ئەو لایەنانە بووە، دیاریشە نارسە، پاش سەرکەوتنی بە سەر لەشکرەکەی بەهرام دا خۆی و دار و دەستەکەی هەر بە گەرمیاندا ڕۆیشتوون بەرەو تەیسەفونی پایتەخت. ئەم زانیارییانەمان لە ڕێی دەقێکی گرنگەوە بەدەست گەیشتووە کە بە نووسینەکەی پەیکولی ناسراوە و لە شوێنەواری پەیکولی. لەوێدا نارسە ناوی ئەوانە دەکات کە لایەنگیریان کردووە و لەو بەشەدا کە ناوی ئەوانەی نووسیوە کە هاتوون بە پیرییەوە دەڵێت: "... و باقی فارسەکان و پارتەکانی کە لە ئاسۆرێستان و (خوزێستا؟)ن بوون و گەرەمایا و سیارزور، هەموو پێکەوە هاتن بۆ هایانی نیکاترا بۆ پێشوازیمان. و لێرە هاتنە حوزوورمان کە ئەم مۆنیومێنتەی تیادا دروست کرا."[٥٤] لە نێو ئەو فەرمانڕەوایانەشدا کە نارسە پاش بوون بە پادشای لە شوێنی خۆی هێشتوونێتییەوە "سەرداری لاشۆم" بووە کە لە دوایین دێرەکانی دەقەکەیدا ئەمەی ڕاگەیاندووە بێ ئەوەی ناوەکەی بنووسێت.[٥٥]

نزیکیی گەرمیان و تا ڕادەیەکیش کەرکوك لە پایتەختی ساسانسسەکانەوە کە لە تەیسەفون (المدائن) بوو، وای کردووە کە زۆر لە ڕووداوەکاندا ناوی نەیەت، بەپێی ئەوەی نەبووەتە مەیدانی شەڕ و شۆڕ و بێنە و بەرەی نێوان ساسانییەکان و دوژمنەکانیانەوە، وەك ئەوەی بەسەر شار و ناوچە سنوورییەکانی نێوان ساسانییەکان و ڕۆمانەکان و پاشتر بیزەنتییەکان هاتووە. بۆیە ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی زانیاریمان کەمتر لە بارەیەوە هەبێت.

یەکێك لە شوێنەوارە گرنگەکانی ئەم سەردەمە کۆشکێکە کە لە گردی ئەبو شعاف لە بەشی باکووری ناوچەی حەمرین دۆزراوەتەوە و دیارە بارەگای فەرمانڕەوای ناوچەکە بووە. کۆشکەکە شێوەیەکی چوارگۆشەی هەیە، هەر لایەکی ٢٧ م درێژە. بە خشتی کاڵ و قوڕ بنیات نراوە و هەندێك شوێنی بە قوڕ سیواغ دراوە و هەندێك شوێنی تری، بە تایبەتی هەندێك ژوور و هەیوانەکەی بە قوڕ و سیواغێك گەچ بەسەریدا. زەویی ژوورەکان و ڕاڕەوەکان و گەنجینە و گۆڕەپانی ناوەڕاستیش بە چینێکی ٢-٤ سم گەچ ڕووپۆش کراوە. دیوارە دەرەکییەکانی کۆشکەکە نزیکەی ١٦٠ سم ئەستوورن و لە هەرچوار سوچەکەشیدا بورجی بازنەییان بۆ ڕاگرتنی و بۆ پاراستنیشی لە هێرشی دوژمن بۆ دروست کراوە. لە ناوەڕاستی هەر لایکیشیدا بورجی نیوە بازنەیی بۆ هەمان مەبەست دروست کراون. نەخشەی ناوەوەی بیناکە ڕێك و هاوشێوەی یەکە ئەگەر لەسەر تەوەری درێژی بکرێتە دوو بەشەوە. گۆڕەپانێك لە ناوەڕاستدایە و هەیوانێکی لەسەرە کە چوار پایەی گەورە لە پێشەکەیدان، دوانیان بە سوچی ژوورەکانی ئەم لا و لایەوە نووساون کە ئەوانیش لە ڕێی ڕاڕەوی تەسکەوە بەسەر گۆڕەپانەکەدا دەڕوانن، دوو پایەکەی تریش بە هیچەوە نەنووساون. ئەم چوار پایەیە لە خشتی سوور و گەچ دروست کراون و لە پایەکانی شارەکانی ئاشور (سەردەمانی ئەشکانی و ساسانی) و نیپپور و مەدائین دەچن و ئەگەر بەراوردی دەروازەی هەیوانە ستووندارەکە لەگەڵ ئەوەکەی کە لە مەدائین دۆزراوەتەوە، بکەین، ئەوا لێکچوونی زۆر دەبینینەوە.[٥٦]

لە دیوارێکی هەیوانەکەدا دەرووەیەك هەیە کە وا پێ دەچێت بۆ پلیکانە بووبێت بۆ قاتی دووەم یان سەربانی بیناکە. ئەم لا و لای هەیوانەکەش دوو ژوور هەن کە بەسەر گۆڕەپانەکەدا دەکرێنەوە و ئەمەش وای لێ دەکات ڕووکاری بیناکە وەك ڕووکاری بیناکانی شاری ئاشور و هاترا (الحضر) سێ لۆیی بن. بەرامبەر ئەم هەیوانەش هەیوانێکی بچووکتر هەیە کە لە ڕێی کۆمەڵێك ڕاڕەوی تەسك دەچێتە سەر گەنجینەیەك کە ٨٠٠ جێ مۆری قوڕینی تیادا دۆزراوەتەوە و بە چەندین جۆر نەخش و نیگاری وێنەی مرۆڤ و ئاژەڵ و نەخشی ئەندازەیی و نووسینی پەهلەوییان لەسەرە.[٥٧] بوونی ژوور بۆ پاسەوان و خزمەتگوزاریی تر ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بۆ نیشتەجێ بوونی فەرمانڕەوا و کارگێڕی و هەروەها مەبەستی سەربازیش بۆ بەرگری بەکار هاتووە.[٥٨]

هەر لە ناوچەی حەمرین، نزیکەی ٧ کیلۆمەترێك لە باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی بەیەك گەیشتنی ڕووباری نارین بە سیروان لە گردی عەبابرە گۆڕێکی گرنگی ئەم سەردەمە دۆزراوەتەوە کە چەندین کەلوپەلی لە ڕووی هونەرییەوە بە بەهای تێدا بوو. لەوانە ئەڵقەی ئاسن و موستیلەی نقێمدار (نقێمەکەی تیادا نەمابوو)، هەندێك گۆزە و کوپەی شین-سەوز باو، چەقۆیەکی ئاسن و لەوانیش گرنگتر چەند دانەیەك گوڵی لە کانزا دروست کراو کە دیارە بە جلوبەرگی بە بەهای کەسانی پلە باڵای کۆمەڵگادا دوورابوون یان بە پشتێن و کڵاو و شتی تری لەبەر کردن.[٥٩]

شوێنەوارێکی گرنگی تری ئەم سەردەمە قەڵای (حەوش کوڕو)ە کە نزیك خانەقین دەبێتەوە و بینایەکی گەورەی ناوازەیە و پێدەچێت یەکێك لە قەڵا مەحکەمەکانی سەر ڕێگا سەرەکییەکانی هاتوو چۆی سەردەمی ساسانی بووبێت و بۆ پاراستنی ڕێگاکە و حەوانەوەی کاروانەکان بنیات نرابێت. هەروەك قەڵایەکی تری لەو جۆرە، بەڵام بچووکتر کە لە دەربەندی خان بنیات نراوە. جێگای داخە کە حەوش کوڕو پشتگوێ خراوە و بەرەو لەناوچوون و داڕمان دەڕوات و تا ئێستاش لێکۆڵینەوەیەکی زانستیی لەسەر نەنووسراوە و نە نەخشەی بۆ کراوە و نە مێژووە وردەکەی ساغ کراوەتەوە.

* سەرچاوەکان:
1-Ahmed، The Beginnings of Ancient Kurdistan، Ph. D. Dissertation، Leiden، 2012.
2-Asmussen، J. P.، Christians in Iran، in: The Cambridge History of Iran، vol. 3، part 2، Cambridge، 1983.
3- Bickerman، E.، The Seleucid Period، in: Cambridge History of Iran، vol. 3، part 1، Cambridge، 2000.
4- Brunner، Ch.، Geographical and administrative Divisions: Settlements and Economy، in: Cambridge History of Iran، vol. 3، part 2، Cambridge، 1983.
5-Budge، The Book of Governors، vols. I and II، London، 1893.
6-Dyakonov، I. M. and V. A. Livshits، Parthian Economic Documents from Nisa، I، London، 1980.
7-Frye، R. N.، The History of Ancient Iran، Darmstadt، 1984.
8-Herzfeld، E.، The Persian Empire، Wiesbaden، 1968.
9-Hoffmann، G.، Auszüge aus syrischen Akten persischer Märtyrer، Leipzig، 1880.
10-Mšiḥa Zkha، The Chronicle of Arbela، Translated by P. Kawerau، English translation by T. Króll، Lovanii، 1985، 8 (Online version).
11-Musil، A.، The Middle Euphrates، A Topographical Itinerary، New York، 1927.
12-Piesl، H. T.، "Tell Ababra، Preliminary Report، " Sumer 40، parts 1 and2 (1984).
13-Ptolemy، Geographia.
14-Skjaervø، P. O.، The Sassanian Inscription of Paikuli، part 3.1، Restored text and translation، Wiesbaden، 1983.
15-Smith، W. (ed.)، Dictionary of Greek and Roman Geography، vol. I، Boston، 1854.
16-Strabo، The Geography of Strabo، Literally translated، with notes by H. C. Hamilton، ESQ، vol. iii، London، 1857.
17- Widengren، G.، Manichaeism and its Iranian Background، in: The Cambridge History of Iran، vol. 3، Cambridge، 1983.
١٨-ئەحمەد، كۆزاد محەمەد، "پەیکولی شوێنەوارێکی گرنگ... دەقێکی لەبیرکراو، " ژین٣ (٢٠١١).
١٩-پیگولوسکایا، ن.، شهرهای ایران در روزگار پارتیان و ساسانیان. تهران، ١٣٧٢ (چاپ دوم).
٢٠-سفر. فؤاد، "المنازل الفرثية لاسيدورس الكرخي، " سومر. المجلد ٢، الجزء ٢ (١٩٤٦).
٢١-الصالحي، د. واثق اسماعيل، "العمارة قبل الاسلام، " حضارة العراق، الجزء الثالث، بغداد، ١٩٨٥.
٢٢-الكسار، عواد، "تنقيبات تل ابو شعاف، " سومر، المجلد ٣٥، الجزء ١ و ٢ (١٩٧٩).
٢٣-ماركوارت، ی. ايرانشهر بر مبنای جغرافيای موسى خورنی، ترجمه: د. مريم مير احمدی، تهران، ١٣٧٣.
٢٤-وهبي، توفيق، الاعمال الكاملة، إعداد رفيق صالح، الجزء ١، السليمانية، ٢٠٠٦.

* لاسیمە:- لەوانەیە هەر هەمان گوندی لاشووم یان لاسینی ئێستا بووە و گۆڕانکاری بەسەردا هاتبێت، لە گوندێکی کاکەییەکان بووە.

دەستەی ئینسکلۆپێدیا

*** كەركوك لە سەردەمی ساسانییەكاندا:**

**د. كەیوان ئازاد ئەنوەر**
**مامۆستا لە زانكۆی سلێمانی**

**(كەركوك) وەك یەكێك لە شارو ناوچە ئاوەدانەكانی ژێر قەڵەمرەوی ئیمپراتۆرێتی ساسانی بە (بیث گرمی- Beth Garme) ناسرا بوو[1]. شارەكەش تەنیا لە قەڵاكەی پێكهاتبوو. واتە قەڵاكە شارەكە بوو، كە بە (كرخا) ناسراو دانیشتووانەكەشی لە كورد پێكهاتبوون[2]. شارەكەش كورەیەكی سەر بە ئوستانی (ئەربێلا)و ئەیالەتی (هەمەدان) بوو. دیارە بەپێی پێكهاتەی كارگێڕی ئیمپراتۆرێتی ساسانی لە سەرەوە بۆ خوارەوە بەم جۆرە بوو (ئەیالەت، ئوستان، كورە، شارستان، ناوچە، گوند)، هەر بۆیە بەپێی ئەم دابەشكردنە كارگێڕییەش هەر ئەیالەتێك لە چەند ئوستانو ئوستانەكانیش لە چەند كورەیەكو كورەكانیش لە چەند شارستانێكو شارستانەكانیش لە چەند ناوچەیەكو ناوچەكانیش لە چەند گوندێك پێكهاتبوونو كاروباری هەریەك لەو دەستە كارگێڕیانەش بە سەروو خۆیانەوە وابەستە كران، كۆی هەمووشیان بە (وەزارەتی كشور) واتە (وەزارەتی كاروباری ناوخۆ) بەسترابوونەوە[3]. لێرەوە (بیث گرمی) یان (كرخا) وەك كورەیەك سەر بە ئوستانی ئەدیابێنی واتە (ئەربێلا)و ئەویش سەر بە ئەیالەتی (هەمەدان) بوو. لەبەر ئەوەشی (هەمەدان)ی پایتەختی بەهارەو هاوینەی دەوڵەت بوو، بۆیە شارەكە سەر بە ئەیالەتی پایتەختی بەهارو هاوینەی ئیمپراتۆرێتی ساسانی بوو. ئەوەش بە مانای ئەوە بوو، كە ئەو شارە لە مەڵبەندی دەسەڵاتی سیاسیو ئابووری دەوڵەتەوە دوور نەبوو. واتە نەكەوتبووە سنووری ئەیالەتێكی دوور دەست یان پەراوێزخراوی ئەو دەوڵەتە لە نموونەی ئەیالەتەكانی (ئاشوور، خوزستان، فارس، كرمان، گورگان، مرۆ، ساج، سیت، ئامودۆن، سریكا، هرات، سجستان، برتیا، ئاراخوزی)[4]. ئەوەش ئاستی پێگەی ئەو شارەی لە ئاست دەوڵەتەكەدا دەرخست.**

**دیارە كاتێك ئاماژە بەوە دەكەین، كە (هەمەدان) پایتەختی بەهارەو هاوینەی دەوڵەت بوو، چونكە بەهارو هاوینی (تەیسەفون) گەرمو شێدارو پاییزو زستانی (هەمەدان) ساردو بەفرو باراناوی بوو، بۆیە هەوڵیاندا لە وەرزەكانی بەهارو هاویندا رووبكەنە شاری (هەمەدان)و بیكەنە پایتەخت، چونكە شارێكی فێنكو بەرز بوو. ئەمەو لە وەرزكانی پاییزو زستانیش روو لە شاری (تەیسەفون) بكەن، چونكە لەو (دوو) وەرزدا ئەو شارە سارد نەبوو. واتە ئەوان بە درێژایی ساڵ لەیەك باری كەشو ئاوو هەوای لەباردا ژیانیان دەبردە سەرو كاروباری دەوڵەتیان رایی دەكرد. لەو سەرووبەندەشدا شارەكە لە هەردوو وەزری بەهارو هاویندا سەر بەو ئایالەتە بوو، كە ببووە پایتەختی دەوڵەت. ئەوەش بەو مانایەی، كە بەهۆی ئەو رووداوەو شارو ناوچەكانی سەر بەو ئەیالەتە لەو (دوو) وەرزەدا بایەخی تایبەتی خۆی هەبوو. واتە (كەركوك) بەدرێژایی تەمەنی ئەو دەوڵەتە سەر بە ئەیالتێك بوو، كە پێگەی سیاسیو ئابووریو ئایینیو تەنانەت فەرهەنگی گەورەی هەبوو.**

**سەربارەت بە مێژووی ئەو شارەش لە سەردەمی ساسانییەكاندا، كە بە درێژایی (٤١٥) ساڵی واتە لەنێوان ساڵانی (٢٢٦-٦٤١ز) فەرمانڕەوایەتی بەشێكی گەورەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیان كرد، كارێكی ئاسان نییە، بەڵكو دۆزینەوەی مێژووی شارەكەیە لە ڕووداو بەسەرهاتەكانیدا، كاتێك كەسایەتییەكی بنەماڵەیی سەر بە ناوچەی (ئەستەخر)ی هەرێمی فارس بە ناوی (ئەدەشێری كوڕی بابەكان كوڕی ساسان) بنیاتی دەسەڵاتێكی نوێداو هەر بە ناوی باپیریشییەوە دەولەتەكەی ناونا (ساسان). ئەوەش دوای ئەوەی كۆتایی بە بنەماڵەو ئیمپراتۆرێتی ئەشكانی هێناو دوایەمین دەسەڵاتداری ئەو بنەماڵەیەی بە ناوی (ئەردەوانی پێنجەم) لە ساڵی (٢٢٤ز)دا كوشت[5]. بەو ڕووداوەش خۆری دەوڵەتو بنەماڵەیەك ئاوا بوو، كە ئەشكانیو ئەشكانییەكان بوونو خۆری بنەماڵەو دەوڵەتێكیش هەڵهات، كە ساسانیو ساسانییەكان بوون. هەرچی كۆتایی دەوڵەتەكەشە بە كوژرانی دوایەمین پادشای ساسانی بە ناوی (یەزدەگوردی سێیەم) دوایی هات، كاتێك لە شاری (مەرۆ)[6]و دوای شكستی سووپاكەی لە شەڕی (نەهاوەند) لە ساڵی (٦٤١ز) لەبەرامبەر سووپای دەوڵەتی خەلافەتی ڕاشدی، بە دەستی ئاشەوانێك كوژرا[7]. بەو هۆیشەوە بۆ ئەبەد كۆتایی بە دەسەڵاتی بنەماڵەو دەوڵەتی ساسانی هات[8].**

**لەو ماوەیەشدا (٣٥) ئەندامی بنەماڵە یەك لە دوای یەك گەیشتنە پایەی دەسەڵاتو ئەوەندەی پێیان كراو بۆیان لوا، كاریان لەسەر بەهێزكردنی پێگەی سیاسی بنەماڵەكەیانو دەولەتەكەیانو پایەی ئابووریو بەهێزكردنی توانا سەربازییەكانی وڵاتو بەرەنگاربوونەوەی نەیارانی ناوخۆو زلهێزەكانی دەرەوە كرد.**

**لەو مێژووەشدا (ئەردەشێری كوڕی بابەكان) سەرجەم میرو گەورەكانی بنەماڵەی ئەشكانی كوشت، كە ژمارەیان گەیشتە (نەوەد) میری ناوچەییو یەكێك لەوان فەمانڕەوای شاری (كەركوك) بوو[9]، بەناوی (كورتان شاهی مادیك)[10].**

**(شاپووری یەكەمی ساسانی)ش لەنێوان ساڵانی (٢٤٢-٢٥٢ز) بایەخی تایبەتی بەو شارانەی سنووری دەسەڵاتیدا، كە (مانی كوڕی پاتك) سەردانیكردنو پەیڕەوانی بۆ پەیامەكەی پەیداكرد. یەكێك لەو شارانەش (بیت گرمی-كرخا) واتە شاری (كەركوك) بوو، كە (مانی) بۆ خۆی سەردانی كردو چەند ڕۆژێك تێدا مایەوە[11]، بەڵام كاتێك لە ساڵی (٢٥٢ز) لەو ئایینی مانی هەڵگەڕایەوە هەڵوێستی بەرامبەر ئەو شارو ناوچانە گۆڕا، كە باوەڕیان بەو ئایینە هێنابوو[12]. لەو چوارچێوەیەشدا ئەو هەڵوێستە شارەكەی گرتەوەو كەوتە گرتنو ئەشكەنجەدانی پەیڕەوانی.**

**(شاپووری دووەمی ساسانی) لەبەر بایەخو گرنگی ئەو شارەو دەورووبەری ئەردەشێری برای، كە بە (ئەردشێری دووەم) ناسرابوو كردە فەرمانڕەوای (حەدیاب-ئەربێل) و (بیث گرمای-كەركوك)[13]. دیارە ئەو كارەی پادشای**

ساسانیش لەبەر ئەوە بوو، کە چ (ئەربێلا)و چ (کەرکوك) پێگەیەکی گرنگی ئایینی مەسیحی بوو[١٤]، بۆیە بەمەبەستی لێدانی ئەو ئایینەو لاوازکردنی پێگەکەی، ئەو برایەی کردە فەمانڕەوای (ئەربێل). دیارە ئەگەر (ئەربێلا) ئوستانێکی سەر بە ئەیالەتی هەمەدان بووبێت، ئەوا (بیث گرمای) وەك کورەیەکی ئەو ئوستانە، گرنگ‌و بایەخی خۆی هەبوو، چونکە مەلبەندی ئوسقوفەکانی ڕەشید خۆرهەلات بوو، بەوەی (ئوسقوف جاثلیق شاهدوخت) سەرۆکی هەموو کەنیسەکانی خۆرهەلات لە شاری (کەرکوك) بوو[١٥]. دیارە سەرباری ئەو پێگەیەی کەرکوك هەیبوو، پادشای ساسانی ئەو بڕیارەیدا. تەنانەت بۆ لێدانی ئەو پێگەیەش، کە بە مەترسی بۆ سەر ئایدیۆلۆجیای دەولەتەکەی دەزانی ئەو ئۆسقوفە مەسیحییەو (١٢٨) کەس لە یارانی لە قەشەو پەیرەوی ئەو ئایینە لە سالی (٣٤٢ز)، کە هەموویان کورد بوون لەسێدارەدا[١٦]. جیاواز لەو هەلوێستانەش هەمان پادشا وەك پێشینەکانی خۆی چەند بنەمالەیەکی خانەدانی پەهلەوی هێنایە ئەو شارەو لەوێ نیشتەجێی کردن[١٧].

لە سەردەمی (بارام کوری یەزدەگوری یەکەم)، کە بە (بارامی پێنجەم) ناسراوە، دوای کوژرانی براکەی گەیشتە پایەی دەسەلات‌و لەنێوان سالانی (٤٢١-٤٣٨ز) فەمانڕەوایەتی کرد[١٨]، فەرمانڕەوای شارەکە باوەڕی بە ئایینی مەسیحی هێناو تەنانەت دوای ئەوەی لە سالی (٤٤٦ز) کوژرا، لەسەر گۆڕەکەی خاچێك دانرا، وەك نیشانەیەك بۆ مەسیحی بوونی[١٩].

(یەزدەگوردی دووەم)یش کە لەنێوان سالانی (٤٣٨-٤٥٧ز) فەرمانڕەوایەتی ئەو دەولەتەی کرد ژمارەیەکی زۆری پەیڕەوانی مەسیحی ئەو شارەی کردە قوربانی‌و لەسێدارەی دان[٢٠].

بە گشتی شارەکە لە سەردەمی ساسانییەکاندا دووچاری تالانی‌و کاولکاری زۆر هات‌و لەو ڕووداوانەشدا پەیڕەوانی مەسیحی ئەو شارە بوونە قوربانی[٢١].

* پەراوێزو سەرچاوەکان:-

١. بڕوانە:

- د. جەمال ڕەشید ئەحمەد، (کەرکوك لە چەرخە کۆنەکاندا)، وەرگێرانی: حەسەن جاف، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی-دهۆك، هەرێمی کوردستانی عێراق-عێراق، ٢٠٠٨ز، لاپەڕە ٦١.

- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، (كركوك وتوابعها-حكم التأريخ والضمير-دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق)، الطبعة الاولي، مطبعة رينون-السليمانية، اقليم كردستان العراق، العراق، بلا، ١/١٥.

٢. جمال رشيد ئەحمەد، (كركوك في العصور القديمة)، الطبعة الاولي، دار آراس للطباعة والنشر-اربيل، اقليم كردستان العراق-العراق، ٢٠٠٢م، الصفحة ٤٧.

٣. ارثر كريستنسن، (ايران في عهد الساسانيين)، ترجمة: يحيى الخشاب، مراجعة: عبدالوهاب عزام، الطبعة الأولى، مطبعة لجنة التاليف والترجمة والنشر- القاهرة، مصر، ١٩٥٧م، الصفحة (١٢٦-١٢٩).

٤. بڕوانە:

- کریستنسن: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ١٢٦.

- مفيد رائف مەحموود العابد، (معالم تأريخ الدولة الساسانية-عصر الاكاسرة ٢٢٦-٦٥١م)، الطبعة الأولى، دار الفكر المعاصر-بيروت، لبنان، دار الشروق-دمشق، سورية، ١٩٩٩م، الصفحة ٩٣.

٥. بڕوانە:

- طه باقر، (مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة)، الطبعة الأولى، مطبعة الحوادث- بغداد، العراق، ١٩٧٣م.

- پيكولوسكايا، ن.و و ديگران، (ايران از دوران باستان تاپايان سده هجدهم)، ترجمه: كريم كشاورز، چاپ پنجم، انتشارات پيام، چاپخانه مروی- تهران، ايران، ١٣٦٣هـ.ش، لاپەڕە ٦٧.

٦. بڕوانە:

- احمد بن يحيى بن جابر البلاذري، (البلدان فتوحها واحكامها)، الطبعة الأولى، المكتبة العصرية-صيداء بيروت، لبنان، ٢٠٠٨م، الصفحة ٢٩١-٢٩٢.

- ابو منصور عبدالملك بن محمد بن اسماعيل الثعالبي، (غرر اخبار ملوك فارس وسيرهم)، باهتمام: زوتنبرك، الطبعة الأولى، باريس، ١٩٠٠م، الصفحة ٧٤٧.

٧. بڕوانە:

- البلاذري، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٩١-٢٩٢.

- الثعالبي، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٧٤٧.

٨. بڕوانە

- ابو حنيفة احمد بن الدينوري، (الأخبار الطوال)، قدم له ووثق نصوصة ووضح حواشية: د.عصام محمد الحاج علي، الطبعة الأولى، منشورات محمد علي بيضون، دار الكتب العلمية-بيروت، لبنان، ٢٠٠١م، الصفحة (١٨٥-١٩٧).

- البلاذري، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٨١-٢٨٣).

- كریستنسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٤٨٦.
٩. (تأریخ تمدن- تحلیلي از تأریخ جهان از آغاز تا عصر حاضر، ترجمة: یعقوب اذند، ضاث سوم، انتشارات مولی- تهران، ایران، ١٣٦٨ه.ش، الصفحة ٤٤.
١٠. بڕوانە:
- دیورانت: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٤٤.
- د. جەمال ڕەشید ئەحمەد، (کەرکوك)، لاپەڕە ٦٠.
١١. ویدن گرن، (مانی وتعلیمات او)، ترجمه: نزهت صفای اصفهانی، چاپ اول، چاپ نوبهار-تهران، ایران، ١٣٧٧ ه.ش، الصفحه ٣٦.
١٢. بڕوانە:
- احمد بن ابی یعقوب: تأریخ الیعقوبي، الطبعة الأولى، مطبعة الغري-النجف، العراق، ١٣٥٨ه، ، ١٣٠/١، غلام رچا انصاف پور: تأریخ زندگی إقتصادی روستائیانو طبقات اجتماعیات ایران از دوران ماقبل تأریخ تا پایان ساسانیان، چاپ اول، تهران، ایران، د.چ، الصفحه ٣٧٠.
- رازی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١١١.
١٣. بڕوانە:
- ادی شیر، (تأریخ كلدواشور)، الطبعة الاولي، المطبعة الكاثوليكية للاباء اليسوعيين-بيروت، لبنان، ١٩١٣م، ٩٥/٢.
- الاب البير ابونا: تأريخ الكنيسة الشرقية، الطبعة الثانية، بغداد، العراق، ١٩٨٥م، الصفحة ٥٤.
١٤. د. جەمال ڕەشید ئەحمەد، (کەرکوك)، لاپەڕە ٦١.
١٥. د. جەمال ڕەشید ئەحمەد: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٦١.
١٦. د. جەمال ڕەشید ئەحمەد: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٦١.
١٧. د.جەمال ڕەشید ئەحمەد: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٦١.
١٨. ابي الحسن بن ابي كرم محمد بن عبدالكريم الجزري ابن الأثير، (الكامل في التأريخ)، تحقيق: ابي الفداء عبداللة القاضي، الطبعة الرابعة، دار الكتب العلمية-بيروت، لبنان، ٢٠٠٣م، (٣٠٨/١-٣١٠).
- حمدالله بن ابی بكر بن ئەحمەد بن نصر المستوفي القزوینی، (تأریخ گزیده)، با اهتمام: د.عبدالحسین نوابی، چاپ چهارم، چاپخانه سپهر-مؤسسة انتشارات امیر كبیر، تهران، ایران، ١٣٨١ه.ش، لاپەرە ١١٢.
١٩. ابونا، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٨٣.
٢٠. د. جەمال ڕەشید ئەحمەد، (کەرکوك)، لاپەڕە ٦١.
٢١. بڕوانە:
- كریستنسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٥.
- گۆڤاری (ئاران)، ژمارە (١٢)، سالی (٢٠٠٠ز)، لاپەڕە ٦، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(کەرکوك لە مێژوودا)، نووسینی: ڕۆفائیل منیاس، وەرگێڕانی: هیوا سالح.

### * سەرەتاکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە ناوچەی کەرکوکدا :

سمکۆ بەهرۆز

((هیچ بەڵگەو دەستنوسێکی مێژوویی نەگۆڕ نییە لەبەر دەستدا، کە دیاری ماوەی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی بکات لە نێو وڵاتی دوو ڕووباردا (میزۆپۆتامیا)، کەڕوویەکی ڕاست بدات بە دەستەوە.

بەڵام هەندێك دابو نەریتی کۆن هەیە دەگەڕێتەوە بۆ بیروباوەری ئایینی مەسیحی لە وڵاتدا، کەدیاری سەرەتاکانی سەدەی یەکەمی زایینی دەکات[1].

هەر لە سەدەی یەکەمدا ئایینی مەسیحی لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتدا بڵاوبووە، بەتایبەتی لە ناوچەکانی ئاقاری (رەها) و (روها)و (ئورفە)ی ئێستاو ناوچەکانی تورکیای خواروو، عێراقو ناوچەکانی سەرو ڕۆژئاوای لە ئێرانو ناوچەکانی هاو سنوور لێیەوە.

سەرەتاکانی ئەم نووسراوانەی مەسیحی لەم وڵاتانەدا دەگەڕێتەوە بۆ مزگێنی دەری ئەم ئایینە کە ئەویش (تۆما) ی، نێردراو، کە یەکێك بووە لە دوانزە قوتابییەکەی مەسیح، هەروەها نێردراوەکانی تر وەکو (ئەدی)و (ئەجی)و (ماری)و گەلێك لە نێردراوەکانی تری بڵاوکەرانی ئایینی مەسیحی[2].

ئایینی مەسیحی لەو ناوچانەدا بڵاوبووە لە یەکەم جاردا، کە لەژێر رکێفی فەرمانڕەوایی ساسانییەکان بوون، هەر چەندە لەو ناوەش بڵاوبووە، بەڵام نەبووە زۆرینەو کڵێسەی دەوڵەتو لە هەمان کاتدا لەلادێو شاریشدا پەرەی سەند[3].

مەسیحییەت بڵاوبووە لە سەدەی یەکەمی زایینی لە ڕێگای شامو ئاسیای بچووك، بەڵام لە دەوری (۱۰۰)ی زایینی، هەندێك کۆمەڵی مەسیحی هەبوون لە دوای ڕووباری دیجلە لە هەولێر، بەڵام بەڵگەی تەواو بە دەستەوە نییە دەربارەی (تبشیر) کردن لەم ئایینەدا لە وڵاتی ڕۆژهەڵاتدا[4].

بەڵام بەڵگەکان ئەوە بە دەستەوە دەدەن کە گوایە (کرخا بیث سلوخ- کەرکوك) لەدوای هەولێر یەکێك بووە لە قەڵا بەهێزەکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە ڕۆژهەڵاتدا.

لە دوای ئەوەی (مار.. ماری) گوندی (بروجیە)ی بەجێهێشتو کەوتە بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی.. بەرەو (بیث جەرما)ی ڕۆیشتو (تۆباوی)دانا بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی، یەکەم ناوچەیەك کە پێدا ڕۆیشت شاری (شەهرقەرد) بوو.

ئەم ناوچەیە پاشایەکی دڵ ڕەقی هەبوو، کە بت پەرست بوو، کرنوشیان بۆ درەخت ئەبردو قوربانی یان بۆ کۆتەڵێکی مسی پێش کەش دەکرد.

ئەم پاشایە کوڕی نەبوو، تەنها کچێکی هەبوو ناوی (ئەفراتیا- افراطیا) بوو کە زۆر خۆشی دەویست، بەڵام نەخۆشی (ئیفلیج)ی هەبوو کە توانای ئیشو کاری نەبوو، (مار.. ماری)و ئەوانەی لە گەڵیدا بوون گەیشتنە دەوری کۆشکی پاشای (شەهرقرد) لەدەرگای کۆشکیان دا، کچەکەی پاشا وەڵامی دایەوە کێیە، ووتی من (مار ماری) م ئەم دەرگایەمان لێ بکەرەوەو ئەم ئاردەمان لی وەربگرەو بیکە بەنان بۆمان، کە خوا پاداشتت بداتەوە، ئێمە لەدوورەوە هاتووینو ناتوانین نان بکرین تکا دەکەین بۆمان ئامادە بکە.

کچەکە هاتە وەڵام وتی:-

ناتوانم هەستم دەرگاتان لی بکەمەوە، لەبەر ئەوەی هەردوو دەستمو پێیەکانم دەستەوەستانو خەڵکی ئەم کۆشکە هەموویان ڕۆشتوونەتە دەرەوە بۆ پێشکەشکردنی قووربانی بۆ خوداوەند.

تۆباوی پێی وت:-

((بە ناوی خوای یەسوعی مەسیحی هەموو ئەندامەکانت خۆی دەگرێتەوە)).

هێشتا تۆباوی قسەکانی تەواو نەکردبوو کە کچەکە چاك بووەوە هەستایە سەر پێو دەرگاکەی کردوەو لە خۆشیدا خەریك بوو باڵ بگرێت.

ئینجا وتی:-

ئێستا ئەی پیاوی چاك کار چییە، چونکە یاسای ناوچەکەمان تا سی ڕۆژ ڕێگە نادات ئاگر بکرێتەوە، چونکە تایبەتە بە پەرستنی خوداوەند، ئەگەر ئەوەی سەرپێچی بکات هەموو سامانێکی دەسووتێنرێت بەڵام تۆباوی بڕیاری پێ دا کە هەستێت بە کردنەوەی ئاگرو کەس ناتوانێت سزای بدات لەسەر ئەم ئاگر کردنەوەیە.

دەستو پێوەندەکانی پاشا هاتن بەپاشایان ڕاگەیاند کە گوایە ئاگر لە ناوچەکە کراوەتەوە ئەویش پێیانی ڕاگەیاند کە برۆن بزانن ئەوە کێیە ئاگری کردۆتەوەو سەرپێچی کردووە تا سزای پاشا وەربگرێت.

بەڵام کاتێك زانیان کە ئاگرەکە لەکۆشکی پاشا کراوەتەوە بەترسەوە ڕاستی ڕووداوەکەیان لەپاشا گەیاند کە ئاگرەکە لەماڵی خۆیدایە.

کاتێك پاشا گەڕایەوە ماڵەوە سەری سووڕما، کچەکەی لەلای تەنوورەکە ڕاوەستاوەو خەریکی نان کردنەوەیە، دامو دەستەی تۆباوی لە دەورین.

ڕووی کردە تۆباوی پێی وت:-

(تۆ کێی؟).

پێی وت:-

(من مرۆڤێکی بەندەی خوای زیندووم).

ئینجا پرسیاری کرد:-

(کێ ئەم کچەی چاك کردۆتەوە، ئەم هێزەی داوە پێی کە خواوەندەکەمان، نەیتوانیووە چاکی بکاتەوە).

((مار ماری))وەڵامی دایەوە:-

(ئەمە مەسیحە کە ئەم کچەی تۆی چاك کردۆتەوە).

پاشا وتی:-

(ئەو مەسیحە کێیە کە تۆباسی لێوە دەکەی).

وتی:-

(نێردراوێکی ئەو خوایەیە کە زەویو ئاسمانی دروست کردووە).

(ئەی باشە خواوەندەكەی ئێمە بۆ توانای چاك كردنەوەی نییە).

مارماری ووتی:-

(چونكە خواوەندەكەی ئێوە بتەو رووحی نییەو شەیتان لە دڵی دایە، تا بۆ ئەوەی راستی لە خەڵكی دوور بخەنەوە).

لە دوایدا پاش ئەوەی كە پاشا گوێی گرت لە رێنومایەكانی ئەم ئایینە تازەیە بڕیاری دا بۆ هاتنە ناو ئەم ئایینەوەو (مار ماری) بڕیاری رووخاندنی تەنووری ئاگرەكەی داو لە جێگایدا كڵێسەیەكی دروست كرد، شوێنی تەنوورەكەی كردە جێگەی پاككردنەوە (تعمید)[5].

لە دوای بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە ناوچەكانی (شەهرقرد)، وەدەروبەری تەشەنەی كرد بە ناوچەكانی تری كەركوك وەكو (زێویە- بیث زیوا)[6]. (خاصە - صاضا)[7]، خورماتوو، داقوق‌و گەلێك ناوچەو ئاقاری تر، ئەمەی كە لێرەدا باسمان كرد كورتەیەكی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی بوو.

ئەگەر سەرنج بدەین ئەبینین كە یەكەم جاری بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لەناوچەی هەولێرەوە گەیشتۆتە ناوچەی كەركوك، ئینجا تەشەنەی كردووە بەرەو شارەكانی تری ناوچەكە.

رێگای بڵاوبوونەوە لەم ناوچەی كەركوك دا بە هۆی پەیامبەروو رابەرانی مەسیحەوە بووە، كە نموونەی قوتابییە زیرەكەكانی ئاڵا هەڵگری ئەم ئایینە بووە.

نەبوونی سەرچاوەی مێژوویی سەلمێنراو لە بۆ ئاڵا هەڵگرانی ئەم ئایینەوە، ئەوەی كە بە دەستمان گەیشتووە بریتییە لە چوارچێوەیەكی خەیاڵی و چیرۆك ئامێز، كە گەلێك كەس‌و ناوەند، باسكراوە ناوەكانیان نامۆیە لێمان.

نەبوونی سەرچاوەی مێژوویی دەربارەی بڵاوكردنەوەی ئایینی مەسیحی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی لە ناوچەی كەركوكدا، ئەوەی كە بەدەستمان گەیشتووە سەرەتاكانی دەگەڕێتەوە سەردەمی ساسانییەكان.

لەسەرەتاكانی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لەناوچەی كەركوكدا، تووشی بەربەرەكانی گەورە نەبووە بە تایبەتی لە سەردەمی پرسییەكاندا، بەڵام گەورەترین بەربەرەكانی كوشتن‌و برین لە سەردەمی ساسانییەكاندا تووشی هات.

سەرەتاكانی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی بووە سەر هەڵدانی ژمارەیەكی چاكی دێرو كڵێسەو پەرستگای ئایینی مەسیحی.

دیاری نەبوونی بۆچوونی پرسییەكان دەربارەی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی.. وەكو ئەوەی بە روونی دیارە لەسەردەمی ساسانییەكاندا.

*** رووداوە مێژووییەكانی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە سەردەمی ساسانییەكان:**

هاتنی ساسانییەكان وەرچەرخانێكی گەورەی دروست كرد لەسەر ئاستی رووداوە مێژووییەكان، بۆ بڵاوكردنەوەی ئایینی مەسیحی چ لە ناوچەی رۆژهەڵاتدا، یان لەسەر ئاستی بەربەرەكانیدا لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی رۆمانییەكاندا لە هەندێك كاتدا بە چاك كەوتۆتەوە، لە هەندێكی تردا بەخراپ شكاوەتەوە بەسەر ئایینەكەدا.

ئەگەر سەیری رووداوە مێژووییەكانی ئەو ماوەیە بكەین دەبینین كە هەموو پاشاكانی ساسانییەكان وەكو یەك‌و لەسەر یەك ئاستدا سەیری ئایینی مەسیحییەكانیان نەكردووە.

هەر لەبەر ئەمەیە دەبینین چەندەها هۆ دەوریان بینیوە لە چەوساندنەوەی ئایینی مەسیحی لە ناوچەكەدا، كە ئەم هۆیانەش كارتێكردنێكی گەورەیان دروست كردووە لەسەر ئاستەنگەكانی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی:

١. شكی تێدا نییە، ئاژاوەو گێچەڵی جولەكەكان دەورێكی گرنگی هەبووە لە دەوڵەتی فارسی دا، بۆ چەوساندنەوەی مەسیحییەكان.

لەبەر ئەوەی جولەكەكان بڵاوبووبوونەوە لە مێزوپۆتامیاو وڵاتی فارس، هەر لە سەردەمی پاشای بابلی‌و ئاشورییەكان، ئەویش لەكاتی یەخسیر كردنیان‌و هاوردنیان بۆ ناوچەكانی رۆژهەڵات، كە ناوچەی كەركوك بەشێكی گرنگی ئەم نیشتەجێیەی جولەكەكان بووە.

كارتێكردنی بازرگانی دەورێكی گرنگی بینی لە بڵاوبوونەوەیان لە رۆژهەڵاتدا، لە سەرەتادا رابەرانی مەسیح لە دەوریان كۆدەبوونەوە بۆ بڵاوكردنەوەی (ئینجیل)، ئەویش ئاسانی تێگەیشتن بوو لەنێوانیاندا ئەویش زمانی ئارامی بوو.

هەندێك لە جوولەكەكان باوەڕیان بە ئایینی مەسیحی هێنا بەڵام هەندێكی تریان دژی وەستان باوەڕیان بە یەهودێتی خۆیان دەهێنا، هەستان بەكاری دژ بە ئایینی مەسیحی، بۆیە هیچ بەسەیر نازانرێت كە زیرەكی‌و لێزانی خۆیان نیشان دا بۆ هەستان بەكاری دژ بە ئایینەكە[8].

٢. دەوری موگە زەردەشتییەكان، ئەویش كارتێكردنێكی گەورەی هەبوو لەو سەردەمەدا، چونكە لەبەر ئەوەی ئایینەكەی خۆیان دەكردە دەسكەلایەك بۆ یەكگرتنی گەل‌و رێكخستنی ریزەكانیان دژی دوژمن[9].

٣. كارتێكردنی كاری سیاسی، ئەویش لەژێر كاری ئەو دوژمنایەتییەی نێوان فارس‌و رۆمەكاندا بۆ هەوڵدان بۆ داگیر كردنی ناوچە سنوورییەكان‌و كێشەی فورسە مەسیحییەكان، كەلایەنگیری رۆمانەكان بوو هەر لە (مرسومی) میلانۆ لە ساڵی (٣١٣)ی زایینی.

٤. بەكار هێنانی چەوساندنەوە وەكو دەسكەلایەك بۆ داپۆشینی لاوازی بەڕێوەبەرێتی‌و كارگێری‌و ئابووری دەوڵەتی فارسەكان، ئەویش هەر لە سەردمی پرسی‌و ساسانییەكان بەردەوام بوو[10].

٥. بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی مانەوی‌و مەزدەكی، دەورێكی

گرنگیان دەبینی بۆ پشتگیری پاشای فارسەکان دژی مەسیحییەکان‌و ئاگر خۆشکردن دژیان تا بەوەی جێگەی خۆیان خۆشکەن‌و بتوانن جێگەی خۆیان لەناو ئایینی زەردەشتی دا بکەنەوە.

٦. خودی کارتێکردنی بیروباوەڕەکانی ئایینی مەسیحی‌و تیژی بڵاوکردنەوەی، وای دەکرد کاربکاتە سەر پاشای ساسانییەکان بکەونە کاری چەوساندنەوە بۆ وەستاندنی ئایینە تازەکە.

٧. دەستە وەستانی بیروباوەڕی ئایینی زەردەشتی لەگەڵ ڕووداوەکانی ڕۆژگار، وای کرد دابمێنێت بەرامبەر بە چارەی پێویست، بیروبۆچوونەکان تووشی داخوراندن بوو بوو چ لەلایەن موگە زەردەشتی‌و پاشای ساسانییەکان، کە ئەمە وای دەکرد ئایینی مەسیح پیرۆز وەربگیرێت‌و بیروباوەڕەکانی ئاستەنگێك بێت بۆ ئەو خۆ دەرباز کردنە، کە ئەمە وای دەکرد زیاتر بەرەو ڕووی چەوساندنەوەی فارسەکان بێتەوە.

٨. دژی هەموو تازەگەری یەك بوون کە بە پێچەوانەی هەستی نەتەوەیی‌و ئایینی ئێرانی، لەبەر ئەوەی قورسایی ئیپراتۆرییەکەیان لەسەر ئەو دوو لایەنە ڕاوەستابوو، وازهێنان لێی مانای فەوتاندنی کەلەپورێکی ڕەچەڵەکی ئێرانی بەرەو هەرەسهێنان دەچێت.

٩. نەبوونی دەسکەلایەکی سیاسی لەلایەن مەسیحییەکانەوە وای دەکرد، کە هەموو دەم تووشی چەوساندنەوە بین، چونکە هێزی سیاسی هەردوو دەوڵەتەکە، تا ڕادەیەك لە بارێکی نەگۆڕ بوو، کەلاسەنگی تەواو ناکەوتە نێوانیانەوە، هەر لەبەر ئەمە بوو مەسیحییەکان بووبوونە بەرداشی هارینی سیاسی هەردوولا.

((لەسەدەی یەکەمدا، کڵێسەی ڕۆژهەڵاتی گەشەی کرد لەژێر ڕکێفی نۆ پاشای پرسی لە ڕەچەڵەکی ئەرشاتییە، بەڵام بەڵگەو زانیاریمان بەدەستەوە نییە دەربارەی پەیوەندی ئەو پاشایانە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی دا، چونکە ئایینی مەسیحی بە تەواوەتی لەم ناوچەیەی نێوان دوو ڕووبار بڵاوبووبووەوە))(١١).

ئەوی ڕاستی بێت هیچ بەڵگەیەکی وا بەدەستمانەوە نییە کە گوایە لەکاتی ئیمپراتۆرییەتی پرسییاندا، ئایینی مەسیحی لەناوچەی کەرکوکدا بڵاوبووبێتەوە، ئەگەر سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی ئایینەکە هەبووبێت، ئەوا بەدەستمان نەگەیشتووە کە گەواهی ئەو ڕاستییە بکات، چونکە سەرچاوەکانی باسی هیچ بەربەرەکانێیەکی پاشای پرسییەکان ناکەن دەربارەی بڵاوبوونەوەی ئایینەکە.

*** ئەردەشیری یەکەم:**

((لە ساڵی (٢٢٦) زایینیدا (ئەردەشیری یەکەم) توانی سەربکەوێت بەسەر فەرمانڕەوایی ئەرشاتی‌و توانی سەلالەتی ساسانییەکان دابمەزرێنێت، کە توانی فەرمانڕەوایی وڵات بکەن، زیاتر لە چوار سەدە.

یەکەم شتێك سەرنجی ساسانییەکانی ڕاکێشا بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی بوو لە ئاقاری ئیمپراتۆریەتەکان، بڵاوبوونەوەیان لەهەموو دەزگاکانی ژیاندا... وایان لی هات هەستن بەکاری هەڵوێست وەرگرتن دەربارەی ئەم ئایینە تازەیە))(١٢).

هەڵوێستی ئەم پاشایە ڕوون نییە دەربارەی ئایینی مەسیحی، ئەوەی کە بەدەستمان گەیشتووە، خۆی لەچەند ڕاوبۆچوونێکی جیاواز دەبینێتەوە:-

((هەندێك سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە هەستا بەزۆر کردنی پەرستگای زەردەشتی، دانانی ژمارەیەکی زۆر بۆ کار ڕایی کردنی پەرستنی خۆر، کە خواوەندی گەورەیە، پابەندی هەموو کەسێك بەڕێز گرتنی، هەستا بە تەنگ پێ هەڵچنینی ئایینی مەسیحی، تا کار گەیشتە ئەوەی هەندێکی کەم هەڵگەڕانەوە لە ئایینەکە..))(١٣).

یان دەڵێن:-

((....هەرچەندە کە بڵاوی کردبووەوە کە (مەزدا) دەپەرستێت بەڵام ڕێزی کڵێسەی (کوفی) دەگرت‌و خستییە سەر شارە تازەکەی کە لە نزیك (تەیسەفون) دروستی کردبوو، کەناوی نابوو (فیەئەردەشیر)(١٤).

سەرچاوەی تر زۆرە بەڵام هەموویان لەدوو تەوەرەوە خول دەخۆنەوەو شتی زیاتری تێدا نییە.

بەڵام دەتوانم بڵێم کە (ئەردەشیری یەکەم) لە سەرەتای هاتنە سەر حوکمەکەیان، جۆرەها کێشەی پاشماوەی پرسییەکانی بۆ بەجێ مابوو، نەدەگەیشتە سەر ئەوەی لە کێشەیەکی وەك ئایینی مەسیحی بکۆڵێتەوە، لەسەرەتادا هەوڵی داوە، کێشە سیاسییە گرنگەکان چارەسەر بکات، تا بەوەی خۆی لە کێشە لاوەکییەکاندا ببینێتەوە، بۆیە ئەگەر ئایینی مەسیحی لە ناوچەکانی کەرکوك‌و هەولێر بڵاوبوبێتەوە، بەشێوەیەکی سروشتی گەشەی کردووەو ئەو بەربەرەکانییە نەهاتووەتە ڕێگای کە جێگەی باسکردن بووبێت... چونکە پاش ئەوەی پاشاکانی تر ئارامیان گرتوو تا ڕادەیەك ئاسودەیی سیاسی لە ئاقارەکەیاندا سەقام گیربوو، ئینجا ئەو ڕاستییە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە لەهەستان بەگێرمەو کێشە لەگەڵ مەسیحییەکانی ئیمپراتۆرییەتەکەیان، تا کار بەوە گەیشت هەستا بەکاری سەربرین‌و کوشتن‌و برین‌و دەرکردنی لایەنگرانی مەسیحی، بۆ ئەوەی هاوسەنگی سیاسییان بکەن بۆ قازانجی ئیمپراتۆریەتییەکەیان.. کە هاو پەیوەست دەبێت لەگەڵ دەوڵەتی ڕۆمانەکان لە دوا ئەنجامی کارەکەیاندا.

*** شاپوری یەکەم (٢٤١- ٢٧٢):**

((گەورەترین پاشای ساسانییەکانە، هەستا بە دروست کردنی ئیمپراتۆریەتی ساسانییەکان، لەسەرەتایی فەرمانڕەواییەکەیدا ڕێگەدەری ئایینی مەسیحی بوو، بەڵام هیچ کاتێك (مرسوم)ێکی دەرنەکرد بۆ کۆتای شەرعییەتی ئەم ئاینە لە ئیمپراتۆریەتەکە، هەر چەندێك بڵێین، بەڵام بە چاوی بەزەیییەوە سەیری مەسیحییەکانی دەکرد، ئەویش لەبەر ئەو چەوساندنەوەی کە تووشیان دەبوو لەلایەن موگە زەردەشتییەکانەوە، بەتایبەتی لەلایەن گەورەی موگەکان (کرتیر).

ئەوەی کە لە سەردەمی شاپوری یەکەمدا یاریدەر بوو بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینەکە، هێنانی ژمارەیەکی زۆری گیراوە ڕۆمانەکان بوو کە هەڵگری بیروباوەڕی ئایینی مەسیحی بوون، دابەشکردنی ئەم گیراوانە بەسەر ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتەکەدا. هەر لەبەر ئەمە بوو گیراوە مەسیحییەکان دەورێکی ئایینی گەورەی بینی لە بڵاوکردنەوەی سرووتی ئایینی لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتدا، هەر چەندە کەتووشی سەرئێشەیەکی زۆر بوون لەو ناوچەی غوربەتییە، کە کار گەیشتە ئەوە هەندێکیان گەیشتنە پایەی گەورە.. گەورە لە ئیمپراتۆریەتی فارسەکاندا.

هاتنی ئەم کۆمەڵەی ڕۆمانییانە بۆ ناوچەکانی ڕۆژهەڵات دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی زۆر زووتر، هەر لە ساڵانی (١١٧-١٣٨)ی زایینی، لەسەردەمی ئەدریانی ڕۆمانی ئەرتەبانی ئەرشاتی، بە هۆی چەوساندنەوەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانەکان وایکرد کە یەکێکی وەکو (ئەسقەف) (تقریگی)، ناوچەی ڕۆمانیا بەجێ بهێڵێت بەرەو ناوچەی (کرخ بیث سلوخ) بچێت، بەڵام ئەوانەی سەردەمی شاپوری یەکەم هەمووی دەگەڕێتەوە نێوان ساڵانی (٢٤٤-٢٥٦-٢٥٩-٢٦٠)ی زایینی[١٥].

((هەندێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە شاپوری یەکەم لە سەرەتایی فەرمانڕەواییەکەیدا، ئارەزووی بەلای (مانەوی)یەوە هەبوو، پشتگیری لە (مانی) دەکرد))[١٦].

لەدوای شاپوری یەکەمەوە، ژمارەیەکی زۆر پاشا هاتن بەڵام هیچ شتێکی ئەوتۆی گرنگ ڕووی نەدا دەربارەیان تا جێگەی باسکردن بێت....وەکو:-

(هورموزی یەکەم، بەهرامی یەکەم، بەهرامی دووەم، بەهرامی سێهەم، فارسیسی، هورمزدی دووەم)).

*** شاپووری دووەم (٣٠٩- ٣٧٩):**

((لەسەردەمی ئەم پاشایەدا باروودۆخەکە بە جۆرێکی تر گۆڕا، شاپووری دووەم هەستا بەداواکردنی هەر پێنج ئاقارەکەی کە ڕۆمانیا داگیری کردبوو لەکاتی پاشای ڕۆمانی (گالیریۆس)، (٣٠٥-٣١١)، کە ئەم بەربەرەکانی و توندوتیژییە بووە هۆی ئەوەی کە ڕوویەکی ئایینی وەربگرێت لەنێوان ئیمپراتۆریەتی فارسی و ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی مەسیحی دا.

سەردەمی ئەم پاشایە بەناوبانگە بە چەوساندنەوەی چل ساڵی دژی مەسیحییەکان، ئەم چەوساندنەوەیەش لەو (مرسومە)وە هات کە هەستا بە دەرکردنی باجێکی زۆر لەسەر مەسیحییەکان بۆ کۆکردنەوەی، دژی شەڕی ڕۆمانەکان، بەڵام کاتێك مەسیحییەکان توانای ئەم باجە زۆرەیان نەبوو تووشی جۆرەها چەوساندنەوەو کوشتن هاتن، لە ساڵی (٣٤١)ی زاییندا[١٧].

ناوچەی کەرکوك شوێنێکی گرنگی ئەم چەوساندنەوەیە بووەو تووشی جۆرەها کاری کوشتن‌و بڕین‌و تاڵان‌و فەوتاندن‌و سووتاندن بووە.

((هەر لە ساڵی (٣٤٣)ی زایینیەوە ناوچەکانی سەرووی ئیمپراتۆریەتی فارسەکان تووشی چەوساندنەوە بوو، بە تایبەتی ناوچەکانی بیث جەرمای (کەرکوك)و حدیاب‌و هەولێر، ئەویش لەبەر ئەوەی بوونی هێزی سەربازی فارسی هەبوو بۆ بەرەو ڕووی هێزی ڕۆمانەکان))[١٨].

((ئەم پاشایە بەوە بەناوبانگە کە لە هەموو پاشاکان زیاتر توندو تیژو دڕێو بوو، بە ناوبانگ بوو بە (شان دەرکەر)، لەبەر ئەوەی کاتێك ئازاری مەسیحییەکانی دەدا، هەڵدەستان بەدەرکردنی شانیان، هەستا بەچەوسانەوەی چل ساڵی، کە ناوچەی کەرکوك لەدوو کاتی جیاوازدا کەوتە بەر شاڵاوی ئەم چەوساندنەوەیە یەکەمیان لە ساڵی (٣٢٨)ی زایینی بوو، کە پێش چەوسانەوەی چلی بوو.

هەستا بەتاڵانی ماڵ‌و موڵك‌و خانویان‌و هەروەها بەسەربڕینی ژمارەیەکی زۆر لێیان، کە ئەمە وایانی لی کرد خۆیان حەشار بدەن لە گەرەکی (خاسە) لە نزیك دێیی (یاروەلی) ئێستا، بەڵام کاتێك شوێنی خۆشاردنەوەکەیان زانرا، هەڵیان کوتایە سەریان‌و بەردە باران کران لەلایەن دەست‌و پێوەندکانیانەوە))[١٩].

هەر لە هەمان ساڵدا هەستان بە شەهید کردنی شەش (راهبات)، کە ناوەکانیان ئەمانە:- تەقلا، داناق، گاگون، مام، ئەمزخیا، ئانا، ئەویش لە ژێر فیتی لایەنگرانی (مانەوی) بووە، کەوایان لە فەرمانڕەوایی کەرکوك (ئەدر خوش سایە) کرد هەستێت بەم چەوساندنەوەیە.

ئەم فەرمانڕەوایە هەستا بە کوشتنیان لە دەرەوەی شار لە ناوچەیەك کە پێی دەڵێن (حۆرا).. دەڵێن کە گوایە لە دوای شەهید بوونیان بە هۆی خوێنەکەیان دەرختێکی هەنجیر شین بووە، کەلە دوایدا ئەو شوێنە پێیان ووتوە (بیث تینا)، بەمانای شوێنی هەنجیر، شوێنی ئەم دەرختە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی کەرکوك لە دووری کەمتر لەنیو سەعات لێیەوە، لە نزیك کڵێسەی (تەهمەزگرد)، کە(کڵێسە سوورەکە)یە[٢٠].

((دەگێڕنەوە لە سەردەمی ئەم پاشایەدا هەریەکە لە (سلطان مهدوخت)و براکانی (ئەذو بردا)و (میهرفرسای) بوونەتە مەسیحی لە سەر دەستی مار (عبدا) ئەسقەفی (خرابە جەلال) لە ناوچەی کەرکوك))[٢١]، وادەگێڕنەوە کە ئەم کوشتنە لە ساڵی (٣١٩)ی زایینی دا ڕووی داوە))[٢٢].

هەریەکە لەوانە، ئازارێکی زۆر دراون ئینجا شەهید کراون..

((لە ساڵی (٣٤٠)ی زایینیدا، شاپوری دووەم بڕیاری شەهید کردنی (مار ئەسحق)، کە یەکێك بووە لە پیاوە

گەورەکانی (کرخ سلوخ)، لەگەڵ (مار شابوو)، ئەسقەف (بیث نیقاطور)، کە گوایە ئەمانە هەستاون بە کاری دروست کردنی کڵێسەو بانگهێشتی زەرەدەشتییەکانیان کردووە بۆ مەسیحییەتی و پشت کردن لە بیروباوەڕەکانیان، هەستان بە بەردە بارانی (مار ئەسحاق)، (مار شاپور) کۆچی دوایی کرد لە بەندیخانە لە ژێر کارتێکردنی ئەو کۆتە قوورسانەی کەپێیەوە بەسترابوو))[23].

هەروەها کوشتنی (مار معنا) لە ساڵی (٣٢٨) لە گەرەکی (خاسە)[24]، کوشتنی پیاوی ئایینی (کاهن) ئیسحاق، لە دێی (حولاسار)، لەدەرەوەی شاری (بیث سلوغ) بەردە باران کرا[25] بە فەرمانرەوایی (ئەذرکوشنف).

کوشتنی هەر یەکە لە (ساسان)و (زرون)و (نوح) و (طیماوي)، لە پیاوی ئایینی ناوچەی (لاشوم) بوون، هەموویان بەسترانەوە بەکوت و ئینجا کوژران.

هەر یەکە لەم ئافرەتانە (باعوثا) شازادەیەکی (کرخ سلوخ)، لەبەردەم کۆشکەکەیدا کوژرا، (تقلا)و (ناق) دوو (راهیبە)ی کرخ سلوخ بوون کوژران بە فەرمانی (ئەذرکوشنف)، (ابیت) و (حاتای)و (مزکیا)یش هەموویان (راهبە)بوون لە ئاقاری (بیث گەرمای)کە شاپوری دووەم بڕیاری کوشتنیانی دەرکرد لە کاتی هاتنی بۆ ناوچەکە[26].

*** ئەردەشیری دووەم ( ٣٧٩- ٣٨٣ ):**

ئەمە لە دوای شاپوری دووەمەوە هاتە سەر حوکم، زۆر دژی ڕۆمانەکان و مەسیحییەکان بوو، ژمارەیەکی زۆری لەو خەڵکە کوشت، کاتی خۆی کە فەرمانرەوایی ناوچەکە بوو، ژمارەیەکی زۆری لە مەسیحییەکانی ناوچەی (حدیاب)و (بیث گەرمای) کوشت[27].

*** شاپوری سێهەم ( ٣٨٣-٣٨٨ ):**

هەستا بە دانانی بەرنامەیەکی تازە بۆ ئاشتی و پەیوەندییەکی چاکی هەبوو لەگەڵ ڕۆمانەکاندا[28].

*** بەهرامی چوارەم ( ٣٨٨-٣٩٩ ):**

لە سەردەمی ئەمەدا پەیوەندییەکی چاك رووی دا لەنێوان ساسانی و ڕۆمانەکان، بۆ دوور خستنەوەی کێشەی (بۆنی) یەکان، کە بووە کێشەیەکی گەورە هەرەشەی لە سنووری هەردوولا دەکرد[29]، ئەمە وای کرد مەسیحییەکان سوود لەم پەیوەندییە وەربگرن.

*** یەزدەگەردی یەکەم ( ٣٩٩-٤٢٠ ):**

ئەو پاشایە سێیەم کەسە کە دەورێکی گەورەی بینی لە گەرانەوەی بەرێوەبەری و ئاشتی بۆ کڵێسەی ڕۆژهەڵات، ئەم پاشایە، هەر لە سەرەتای فەرمانرەواکەیەوە سیاسەتێکی تازەی گرتە بەر جیاواز لە سیاسەتی ئەوانەی لەوەو پێشی ساسانییەکان، هەستا بەگرتنی پەیوەندی ئاشتی لەگەڵ ڕۆمانەکان و کاری چاککاری لەگەڵ مەسیحییەکاندا، وای دانان کە ئەمانە بێگانە بن لە دەوڵەتەکەیدا، هەر چەندە کە هیچ سەرچاوەیەکی مەسیحی ئەم پاشایەتی هەڵنەداوە لە جیاتی ئەم چاکەیەی.

هەر چەندە کە (یەزدەگەردی یەکەم) ئارەزووی لە ئاشتی بوو. بەڵام رووییەکی توندو تیژی پاشای ساسانییەکانی هەبوو... هەندێك سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە گەیشتبووە ئەوەی باوەڕ بە ئایینی مەسیحی بهێنێت، بەڵام نەبینین سیاسەتی توندو تیژی لەدوا دوایی حوکمەکەیدا بە دەرکەوت، کە کار گەیشتە ئەوەی بووە دوژمنی مەسیحییەکان، ئەویش لە ژێر کارتێکردن و توورەیی زەرەدەشتییەکان دژی بۆ تۆڵە لە مەسیحییەکان[30].

لە کۆتایی فەرمانرەوایی ئەم پاشایەدا، ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانی (بیث گەرمای) شەهید کران، کە کەرکوك بەشێکی گرنگی ئەو کوشتن و برینە بوو.

*** یەزدەگەری دووەم ( ٤٣٨-٤٥٧ ):**

ئەمە کوری (بارامی پێنجەمە)، ئەمە پیاوێکی ڕاڕابووە هەرچەندە کە گەیشتبووە ئەوەی کە ئایینی مەسیحی لەسەر هەموو ئایینەکانەوەیە، بەڵام هەستا بە چەوساندنەوەیان لەنێوان چەند ماوەیەکدا، لە مێژوویی شەهیدەکانی (کرخ سلوخ)دا وا هاتووە کە لە سەرەتادا بەزەیی بە مەسیحییەکاندا هاتووە، بەڵام لە دوایدا توورە بووەتەوە بەسەریانداو سیاسەتەکەی گۆڕیوە، هەستاوە بە کوشتنی ژنەکەی کە مەسیحی بووە، بۆیە دەتوانین بڵێن کە حەوت ساڵی فەرمانرەواکەی ئاشتی بووە، بەڵام لە هەشتەم ساڵدا چەوساندنەوە دەستی پێ کردووە دژی لایەنگرانی مەسیحییەکان و ژمارەیەکی زۆری لە گەورە پیاوانی ئیمپراتۆریەتەکەی لە ناودا.

هەستا بە دروست کردنی شارێکی تازە بەناوی (شهرستان یەزدەگرد)، لەوێ کاری کرد بە دەرکردنی هەموو ئەو مەسیحییانە کە لە سوپاکەیدا بوون، کە گوایە ئەمانە هۆی شکست هێنانی سوپاکەن بەرامبەر دوژمن، نزیکەی هەشت هەزار (زەرەدەشتی) دانا لە کاروبارەکانیدا لە جێگەی ئەوان.

کاتێك لە (طشول) گەرایەوە بۆ پایتەخت، نووسراوێکی نووسی بۆ (تەهمەزگرد مونزابد)، کە لەو کاتەدا لە (نصیبین) بوو، چونکە ڕێکخەری ئایینی مەجوسی بوو، داوای لێکرد (اذر فرا گرد)ی بەرپرسی (ئەرزون)و (سورین) فەرمانرەوایی (ئەدیابین)و (بیث گرمای) ببات لەگەڵ خۆیدا بروات بۆ (کرخ بیث سلوخ)، بۆ ئەوەی وا لە مەسیحییەکان بکەن لەو ناوچەیە تا واز لە مەسیحی بهێنن و بگەرێنەوە سەر کرنووش بردن بۆ ئاگر، ئەگەر لەکاتێکدا کرنوشیان بۆ خۆرو ئاگرو ئاو نەبرد بکەونە ئازاردانیان هەتا مردن تا ئەو کاتەی هەڵدەگەرێنەوە لە ئایینەکەیان.

گەیشتنە شار، هەریەکە لە (تەهمەزگرد)و هاورێکانی لە پانزەهەمی تەمووز، کەوتنە گرتنی پیاوە گەورەکان و سەرۆکەکانی شارەکە ئازارێکی زۆریان داو پەستیانە ژووری بەندیخانەوە، ئەو کەسانەیان کۆکردەوە بۆ ئازاردان کە هیچ بەزەیی لەدڵیاندا نییە.

کاتێك (یوحنا) ئەسقەف (کەرخ) ئەمەی دیت نامەیەکی

بۆ (بطریکی ئەنتاکییە) نووسی تا هەستێت بەکاری نوێژ کردن بۆ ڕزگارکردنی ئەم (ئەبرەشی)یە سەر لێشێواوە تا بەوەی کە خوا ڕزگاریان بکات لەو خۆبەخت کردنەی کە باسی لێوە دەکرێت.

لە هەمان کاتدا (یوحەنا) هەستا بەکاری نوێژ کردن لە کڵێسە بۆ ڕزگار کردنیان لەم تەنگو چەڵەمەیەو خوا بە تەنگیانەوە بێت، ئەویش هەر لە کاتی هاتنی (تەهمەزگرد) بۆ (کەرخ) لە یانزەیەمی تەمووز.

(تەهمەزگرد) داوای کرد لەبت پەرستو مانەوییەکان بۆ تاڵانی ماڵو موڵکی مەسیحییەکانی ناوچەی (کەرخ)، بۆیە ئەوەی کە کاری گرتنی مەسیحییەکانیان پێ سپێرا بوو هەستان بە تاڵانو بردنی ماڵی مەسیحییەکان.

ژمارەیەکی زۆریان لە پیاوو ژنی مەسیحییەکان گرت، لەگەڵ (ئەسقەف)و (کاهن) و (شماسە)کان، هەستان بەگرتنی (مطرافولیط)ی هەولێرو ئەسقەفی (بیث نوهدار)و (مصلت)و (مطرافولیط)ی (شهرقرد)و جێگرەکەی (یوحەنا) ئەسقەفی کەرخو ئەسقەفی (لاشوم)و (ماحوزا)و (خربە جلال) و (بلدە دارا) لەسەر زێی بچووك، ئینجا کەوتنە کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆری لایەنگرانی مەسیحی لە دەورووبەری (کەرخ- کەرکوك)، بۆیە ژمارەی گیراوەکان بە گشتی گەیشتە (١٣٣) هەزار کەس لەگەڵ ئەو گیراوانەی ناو کەرکوك کە خۆی دەدا لە (٢٠) هەزار کەس.

تەهمەزگرد، چووە ئەو شوێنەی کە پێی دەڵێن (بیث تیتا)، کە لە سەردەمی شاپوری دووەم ژمارییەکی زۆری لایەنگرانی مەسیحی لێ شەهید کران، ئینجا کەوتە نیشاندانی ئەو کەرەستەو پێویستییانەی چەوساندنەوە دژیان ئینجا وتی:-

((پاشا یەزدگەرد فەرمانی پێم داوە، کە ژیانیان پەیوەستە بەم کەرەستەی چەوسانەوەیەوە، ئەگەر سەر دانەوێنن بۆ فەرمانەکانیو کرنووش بۆ خۆر نەبەنو ئاو ئاگر بە پیرۆز دانەنێن ئەوا تووشی سزای خۆتان دەبن)).

لەهەمان کاتدا هاتن، بەهێنانی شانزە فیل بۆ خستنە ژێر پێ لەقەیان ئەگەر هاتوو کرنووش نەهێنن، (ئیسحاق) هەستا بە چاو سەیر کردنی کەرەستەکانی کە بۆیان دانراوە، ئینجا وتی:-

((سەلام لەم کەرەستانە کە بە هۆیەوە دەچینە بەر قاپی دروستکەری ئاسمانو جیهانو ئەو ڕۆشناییەمان پێ دەبەخشێ کە (مەسیح)ی پیرۆز باسی دەکات..)).

دەمی کردەوە ڕوویانی لێکرد:-

((بۆ ڕاوەستاوی ئەی فەرمانڕەوا، نزیك بەرەوە ئەو کارە جێبەجێ بکە کە پێت سپێراوە، هەموومان ئامادەین ببینە شەهیدی مەسیحی پێغەمبەر..)).

کە گوێی لەم قسانەی (ئیسحاق) بوو بریاری دا:-

((لەسەر زەوی درێژی بکەنو کۆت بکەنە دەست وپێیو گۆشتی لەشی بەشانەی ئاسنین پارچە پارچە بکەن، تا بەوەی گۆشتەکەی لە ئێسقانەکانی جیا دەبێتەوە.

لاشەکەیان لەسەر گردۆڵکەیەکی (بیث تیتا) فرێ دابوو ئازاریان دەدا، خوێنەکەی ڕێچکەی بەستبووە نێو یەکێك لە درزەکانی ئەو گردوڵکەیەی (بیث تیتا)وە لە دوایدا (تەهمەزگرد) بریاریدا بەهێنانی هەموو بەندییە مەسیحییەکان لە هەمان شوێنو وەکو (ئەسحاق) ئازار دەدرێن ئەگەر دان نەهێنو کفر بە مەسیح نەکەن.

ئینجا بریاریاندا بە هێنانی (قلیس) یۆحەنا ئەسقەفی (کەرخ سلوخ)، هێنایانە ئەو شوێنەی کە (ئەسحاق)ی تێدا شەهید بوو، دەستەکانیان بری خوێن ڕێچکەی بەست لەو شوێنەدا، ئینجا لەگەڵ شەست کەسی تردا کۆت کرانو بردرانە ڕۆژهەڵاتی ئەو شیوەی بیث تیتا بۆ کوشتنیان... هەندێکیان دەستو قاچیان برایەوە، هەندێکیان چاویان دەرکرا، هەندێکیان پێستی سەریان داماڵی، لەدوایدا بریاریاندا بە هێنانی زەلو گەڵای درەختو داوای نەوتیان کرد ئینجا چەوریانیان کرد بە نەوتو ئاگریان لێیان بەردا هەموویان شەهید کران.

هەر لەو ڕۆژەدا ئەسقەف (یوحەنا)و کاهن (دادیشوع)و (شوحا لبیثو)و (بختیشوع)و بیستو هەشت کەس لە پیاوە گەورەکانی (کەرخ) شەهید کران، کە دەکاتە ڕۆژی بیستو چواری مانگی ئاب.

لە (٢٥)ی ئاب دا هەستان بەهێنانی سی هەزار کەسی تر، (تەهمەزگرد) هاتە ئەو شوێنە بۆ دروست کردنی سەربڕینێکی تر، بەڵام ئەم پاڵەوانانە بە ڕوویاندا هاواریان دەکرد:-

((تۆبە ئەی خوا کە ئێمە بەجێ بهێڵین، ئەو کەسەی کە بووە قوربانی ئێمە، خۆمان دەکەینە قوربانی دژی ئەو شەیتانانە..)).

هەر چەندە کە چەوسانەوەیان زیاد دەکردە سەریان، ئەوەندەی تر ڕۆحی بەرگرییان زیادی دەکرد بە ڕوویاندا، لەنێوانیاندا دوو (کاهن) (ئیسحاق)و (ئەسطیفانس) هەبوو.

حاکمەکە بریاریدا بە بەردە باران کردنیان لە شوێنێکی دێی (کنار)، بەڵام دوو (کاهن) هەریەکەیان لە خاچ درانو ئینجا بەردە باران کران، هەریەکە لە (ئیبراهیم) و (شهون) و (مصنا) یان هێناو کۆت کرا بوون بە زنجیرو درانە بەر تیروکەوانو فرێ درانە ئەو چاڵانەی کە لە پشتیانەوە دانرابوو، ئینجا بزماریان سوور دەکردو دەیان کردە چاویانەوە... بۆ ئەوەی بە ئازارەوە بیان کوژن.

لە ڕۆژی سێیەم هەستان بەهێنانی هەشت هەزارو نۆسەدو چل کەس، کە ئەمانە هێنرابوو لە دێو شارە دوورو نزیکەکانی ناوچەی (کەرخ)، کە لەنێوانیاندا (مطرانولیط) ی (شەهرقرد)و ئەسقەفەکانی (لاشوم-داقوق)و (ماحوزا-حەویجە)و (خربە جەلال)و (بلدە دارا).

فەرمانڕەوای ئەم کارە هەستا بە دانانی سی هەزار مەجوسی لەوانەی کە هیچ بەزەیی لە دڵیاندا نییە تا بەوەی ئازاری جۆربەجۆریان بدەن، کە هەندێکیان بە شیرو هەندێکیان بەئاگر، بەردەباران کردنو چاویان هەڵکۆڵین.

ئافرەتێك هەبوو لە هۆزی (زادوق) ناوی (شیرین) بوو لە کاتی شەهید بوونی ئەو پیاوانەدا، ئەم نانی دەکرد لە ماڵەوە، کە هەواڵی ئەم کوشتنو برینەی (تەهمەزگرد)ی بیست، هەستا نانەکەی بەجێ هێشتو هەردوو منداڵەکەی بردو ڕۆیشت یەکێکی لەسەر شانیو ئەوەی تری بەدەستەوە

گرت، بە پرتاو خۆی گەیاندە (تەهمەزگرد) لەلای (حورا). ڕەشمەی وڵاخەکەی گرت‌و بە فارسی کەوتە قسەکردن لەگەڵیدا، داوای کرد کە بێ بەشی نەکات لەو ڕێگەیی ئەمانە گرتوویانەتە پێش.

(تەهمەزگرد) زۆر سەری سوڕما لەم کارەی ئافرەتە. زۆر هەوڵیدا کە لە قسەکەی پەشیمانی بکاتەوە بەڵام سوودی نەبوو بۆیە بڕیاریدا کە سەری خۆی‌و کوڕە گەورەی ببڕن بەڵام کوڕە بچکۆلەکەی شیرین خۆی دا بەسەر هەردوو لاشەی دایك‌و براکەیداو دەستی کرد بەگریان‌و بە خوێنەکەیان چاوو لەشی خۆی پێ دەسڕی، هەر چەندێك هەوڵیان دەدا کە دووری بخەنەوە سوودی نەبوو، هەڵی بخەڵەتێنن بەدیاری‌و قسەی خۆش، بۆیە خۆی لە دەستیان ڕادەپسکان‌و دەچووە سەر لاشەکەی دایك‌و براکەی‌و بەسەریانەوە دەگریا، بۆیە ئەویشیان بە دەردی ئەو دووانە برد.

لە دوای کاری ئەم کوشتن‌و بڕینە کاری کردە سەر (تەهمەزگرد)و چاوی کردەوەو هەستی بە پەشیمانییەکی گەورە کرد لەسەر ئەم سەربڕین‌و لێدان‌و تاڵانەی دژی مەسیحییەکان کردی، هەر لەهەمان جێگەدا بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد:-

((منیش مەسیحیم)).

لەگەڵ خۆیدا قسەی دەکردو دەگریاو لە مەسیح دەپاڕایەوە کە لێی خۆش بێت دژی ئەو تاوانانەی کە کردوویەتی.

کاتێك هەواڵ گەیشتە (یەزدەگردی دووەم) دەربارەی واز لێهێنانی (تەهمەزگرد) لە (مەجوسی)و بوونی بە (مەسیح) بڕیاری دەرکرد دەربارەی ئازاردانی.

چەندێك ئازاریان داو بەندیان کرد بە کۆت بەستیانەوە هیچ سوودێکی نەبوو، بۆیە بڕیاری دەرکرد بە لە خاچ دانی‌و کوشتنی، ڕۆژی (٢٠)ی ئەیلول ساڵی (٤٤٦)ی زایینی، ساڵی شەهید کردنێتی[٣١].

*** فەیروز (٤٥٩-٤٨٤):**

ئەمە پاشایەکی چاکی ئاشتی مەسیحییەکان بوو، هاوڕێی (برصوما)ی مەترانی (نصیبین) بوو، بۆیە لە سەردەمی ئەمدا شتێکی وا ڕووی نەدا کە جێگەی باسکردن بێت[٣٢].

*** بالیش (٤٨٤-٤٨٨):**

ئەمە کوڕی پاشا فەیروزە، مێژووی (المسعردي) بە (میلاس) باسی دەکات، هاوڕێی مەسیحییەکان بوو، ڕێگەیانی دا بە دروست کردنەوەی کڵێسە ڕووخاوەکانیان[٣٣].

*** ماوەی هەرمس هێنان‌و وەستان:**

لە نیوەی یەکەمی سەدەی شەشەم، دادەنرێت بە ماوەی هەرمس‌و وەستاندنی کڵێسەی ڕۆژهەڵات بە شێوەیەکی گشتی. بووە هۆی بڵاوبوونەوەی جیابوونەوەی بیروڕاو بەربەرەکانی‌و شەڕو ئاژاوەی نێوان خۆیان لەسەر دەسەڵات‌و، کەمی بایەخ دان بەکارو بارە ئایینییەکان‌و پشتگوێ خستنی یاساو شەرعییەتەکان، هیچ دیاردەیەکی تازەکردنەوەو بڕاف‌و ئەفراندنی وانەبوو کە ئەوە بگەیەنێت کە کڵێسە بەرەو پێشەوە بڕوات هەریەکێك هەوڵی بەرژەوەندی خۆی دەدا، دانانی سەرۆك لەو چوار چێوەیە خۆی دەدیتەوە بۆیە لە ماوەی چل ساڵدا کڵێسە لە ژێر ئەم بارە قورسەدا دەیناڵاند‌و داوای ڕزگارکردنی دەکرد[٢٤].

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو ماوەیەیی فەرمانڕەوایی ساسانییەکان لە ناوچەی کەرکوکدا ئەم سەرنجانەمان لا گەڵاڵە دەبێت:

١. ڕەنگ دانەوەی بەربەرەکانی نێو هەردوو دەوڵەتی ساسانی‌و ڕۆمانەکان، بووە هۆی بڵاوبوونەوەی کارتێکردنی لەسەر ئایینی مەسیحی لەناوچەی کەرکوکدا.. چونکە ئەو بەربەرەکانییە سیاسییە وایکرد کە ناوچەکە بارێکی ئاسوودە بەخۆیەوە نەگرێت‌و هەردەم ئایینی مەسیحی لەناو بووەتەی ئەو بەربەرەکانییە خول بخواتەوە، چونکە ستراتیژی ناوچەیەکی وەکو کەرکوك جێ پەنجەی دیارە لە سەر ئەو بەربەرەکانییە.

٢. ڕووداوەکان وا دەسەلمێنن کە گرنگی ناوچەکە هەردەم جێگەی بەربەرەکانی‌و پێکدادان بوو، کە ئەمیش لەگەڵ خۆیدا کەلەپورێکی گەورەی مەسیحی ڕاپێچ کردووە.

٣. ڕەنگدانەوەی بەربەرەکانی سیاسی دەوری خۆی دۆزیوەتەوە لە ڕەنگدانەوەی جۆرەها ئایینی جۆر بەجۆر لە گۆرەپانی ناوچەکە.

٤. چونکە ئەو جۆرەها بیروباوەڕە ئایینەی کە لە ناوچەیەکی وەکو کەرکوك هەبوو وای لێدەکرد لەگەڵ بەرژەوەندی سیاسی گۆرەپانەکە هەردەم لەدابەزین‌و نزم بوونەوەدا بووبێت‌و بەو جۆرە ئایینی مەسیحی لەگەڵ تێکەڵ بوونی ئەو جۆرەها ئایینەدا تێکهەڵکێش بووە، کە گەلێك جار کاری خوێناوی لێکەوتۆتەوە.

٥. ئەوەی سەرنج دەدرێت ئەوەیە مەسیحییەکانی ناوچەی کەرکوك لە کاتی ساسانییەکاندا تووشی جۆرەها چەوسانەوەو ئازاردان‌و دەرکردن‌و تێهەڵدان‌و کۆچ کردن بوون کە ڕێژەیەکی زۆری چەوساوەکان بەر (کەرخ - سلوخ) کەوتووە.

٦. نەبوونی سیاسەتێکی نەگۆڕی پاشای ساسانییەکان دەربارەی مەسیحییەکانی ئیمپراتۆرییەتەکەیان.. ئەوەیش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە هەر پاشایەکیان جۆرێکی نەگۆڕی نەبووەو هەردەم لەژێر کارتێکردنی موگە زەردەشتی‌و پیاوی ئایینی مانەوەییەکاندا هەڵوێستیان بەرامبەر مەسیحییەکان دەبرییەوە.

٧. دیاردەیەکی ترسناك ڕوویدا کە ئەویش بەربەرەکانی

خودی نێوان ئاڵا هەڵگرانی مەسیحی بوو، کە وردە وردە لە ڕێڕەوە پیرۆزەکەیان لایانداو کەوتنە هەوڵدان بۆ هاتنە سەر تەختی (ئەسقەف)و (مطراني) ئایینی مەسیحی.

٨. ئەوەی لە تایبەت مەندی سەردەمی ساسانییەکاندا بەرچاو دەکەوێت، دەست نەکەوتنی پاشماوەی پێویست دەربارەی هونەری بیناکاری تەرزی کڵێسەو نەخش و نیگارو هونەری (ئەیقۆنات).

٩. ئەو شەڕو ئاژاوەیەی کە لە ناوچەکەدا هەبووە، بووە هۆی لە دەست دانی کەلەپورێکی زۆری هونەری ئایینی مەسیحی، ئەوەی بە دەستمان گەیشتووە تەنها پاشماوەیەکی پچڕ پچڕە.

*** مێژووی ئەسقەفەکانی ناوچەی کەرکوك لە ساڵی (١١٧-١٤٩٧) زایینی:**

لەدوای بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە ناوچەکانی سەرووی عێراق لە بیث گەرمای و حدیاب و حلوان و موسل، وای لێهات هەولێر (حدیاب) یەکێك بوو لەو شارانەی کە بووە هۆی زۆری بڵاوبوونەوەی ئاینیی مەسیحی تێیدا. تا کار بەوە گەیشت (فافا جاثلیق) بەرزی کردەوە بۆ کورسی (مطرافولیطیة)، کە لە ژێر ئاقاریدا نۆزدە ئەستەفییەی هەبوو کە سێیەمیان شاری کەرکوك بوو، کە یەکێك بوو لەو شارانەی کە گرنگ بووە لە دوای (هەولێر)، تا بەوە پێویستی کردووە (مار شمعون برصباعی)، مەترانی بۆ دروست بکات لە (شەهر قرد) لە یەکەم جاردا لە ڕۆژهەڵاتی (کرخ سلوخ)، ئینجا لە (کەرخ سلوخ)، تا وای لی هات ئەو مەترانییە هەردوو ناوچەکەی گەیاندووە کە بووەتە دوو کورسی، کە ئەوی تریان بە (کەرخ سلوخ) بە ناوبانگ بووە، لە دوایدا بووەتە یەك کورسی مەترانی بە ناوی (کەرخ سلوخ)، ناسرابوو بە (باجرمی) یان (بیث گەرمای) کە ناوی هەموو ئاقارەکە بووە.

(مار شمعون) هەستاوە بەدانانی مەترانی باجەرمییەکان کە زۆری باجەرمییەکان (نەستورین). لەسەر کورسی (کەرخ سلوخ) ژمارەیەکی زۆر لە ئەسقەف و مەتارنەی زۆر هاتوونە، کە ئەوانەی لەو کورسییە دانیشتوونە لە سەردەمی (مار عقبلاها) بە پلەی (ئەسقافە) بوو، بەڵام لە دوایدا کۆمەڵگەی ئیسحاق جاثلیق لە ساڵی (٤١٠)ی زایینیدا بووەتە کورسی (مطرافولیطي).

**١. (طوقریطس):**

لە وانەیە ئەمە یەکەم ئەسقەفی کورسی (کەرخ سلوخ) بێت لەنێوان ساڵانی (١١٧-١٣٩)ی زایینی لە سەردەمی (ئەدریانۆس)ی قەیسەری ڕۆما، ئەمە لە بنەڕەتدا خەڵکی سوریایە، بە ڕەزامەندی مەترانی (شەهر قرد) کرایە ئەسقەفی (کەرخ سلوخ).

**٢. (عبد یشوع):**

هیچ شتێك دەربارەی مێژووی دەستبەکاربوونی نازانرێت.

**٣. (مار معنا):**

ئەمە لە دەوری ساڵی (٣٢٨)ی زاییندا بوو بە ئەسقەفی (کەرخ سلوخ)، بەڵام لە هەمان ساڵ شەهید بوونی لە گەرەکی (خاسە) لە سەردەمی پاشا شاپوری دووەم (٣١٠-٣٨٠)ی زایینی.

**٤. (مار ئەسحق):**

لە دەوری ساڵی (٣٤٠)ی زایینی دامەزراوە، کە یەکێکە لە پیاوە گەورەکانی (کەرخ سلوخ)، کە لە هەمان ساڵدا شەهید کراوە.

**٥. (مار یۆحەنای یەکەم):**

ئامادەی کۆمەڵگەی نیقاوی بوو لە ساڵی (٣٢٥)ی زایینی، ئەمە شەهید کرا لە چەوساندنەوەی چل ساڵی (٣٤١- ٣٨٠) لە سەردەمی جاثلیق (مار شمعون برصباعی) لە ساڵی (٣٤٤)ی زایینیدا کاتێك شاپور لە شاری (شەهر قرد) بوو، هەستا بەگرتنی ئەسقەفەکەی (نرسی) کە لە تەمەنی هەشتا ساڵی لەگەڵ قوتابییەکەیدا (یوسف)، بڕیاری کوشتنیانی دەرکرد.

**٦. (مار عقبلاها):**

لەسەردەمی (دار یشوعی یەکەم)ی جاثلیق (٤٢١-٤٥٦)ی زایینی، لە خێزانێکی خانەدانە لە (کەرخ سلوخ) لەدایکبووە، کاتێك تەمەنی بووەتە پانزە ساڵی کەوتۆتە خوا پەرستی، گیانی بەزەیی هەبووە بەرامبەر هەژارو لێقەوماوان، ژمارەیەکی زۆری لە (مەجوس)و (مانەوی) هێناوەتە سەر ئایینی مەسیحی لە دانیشتووانی دێی تسین (تسعین)ە، چونکە ئەمانە بتێکیان دەپەرست بە ناوی (نانی).

لە ساڵی (٤١٠)ی زایینیدا هەریەکە لە (مار عقبلاها)و ئەسقەفەکانی (بیث گرمای) لە کۆمەڵگەی ئەسحق جاثلیق ئامادە بوون، بڕیاری ئەوەیان دا کە کورسی کەرخ سلوخ ببێتە مەترانی کە ئەبرەشی بیث گەرمای بنکەکەی لە (کەرخ سلوخ) بێت و کورسی ئەسقەفەکانی بەم جۆرە بێت:

ئەسقەفی (شەهر قرد).

ئەسقەفی لاشووم (نزیك داقوق).

ئەسقەفی خەربە جەلال.

ئەسقەفی دارا.

ئەسقەفی ماحوزا (مارحوزا).

ئەسقەفی (تحل).

ئەسقەفی (بیث نیقاطور).

ئەسقەفی (بورزان).

**٧. (برحذ بشبا):**

لە داوای مردنی مار (عقبلاها) لە سەر کورسی کەرخ سلوخ دانیشت.

**٨. (أخسنسایا):**

هیچ شتێك دەربارەی مێژووی دەستبەکاربوونی نازانرێت.

**٩. (شاپور براز)، (بۆرزین):**
مێژووی دانیشتنی دیار نییە، بەڵام پیاوێکی چاك و دڵ فراوان بوو، بایەخی بە لێقەوماوان دەداو نەخۆشخانەیەکی تایبەتی بۆیان دروست کردبوو.

**١٠. (مار یۆحەنای دووەم):**
لە دوای شاپور براز هاتە سەر کورسی (کەرخ سلوخ) لە سەردەمی جاثلیق دادیشوعی یەکەم (٤٢١-٤٥٦)ی زایینی، شەهید بوو لە ڕۆژی (٢٤)ی ئابی ساڵی (٤٤٦)ی زایینی لە سەردەمی (تەهمەزگرد).

**١١. (مار مارون):**
ئەم پیاوە (یوحەنای سێیەمە) کە دێری مار (تەهمەزگرد) (کڵێسە سوورە)کەی دروست کرد لە ساڵی (٤٧٠)ی زایینی بۆ یادی ئەو شەهیدانەی کە کوژران لە سەردەمی بابۆی جاثلیق.

**١٢. (مار بختیشوع):**
لە سەردەمی جاثلیق مار بابای (٤٩٧- ٥٠٣)ی زایینی بوو ئامادەی کۆڕی (پاپایی) بوو لە مەداین لە ساڵی (٤٩٧)ی زایینی لەگەڵ (٢٣) (ئەبا و)دا.

**١٣ - (مار موشی):**
لە سەردەمی (مار ئەبای یەکەم) (٥٤٠- ٥٥٢)ی زایینی بوو کە قوتابی ئەو (جاثلیق)ە بوو.

**١٤- (مار یعقوب):**
یەکێکە لە قوتابییەکانی (ئەبای یەکەم)، جاثلیقی مار کربای یەکەمی جاثلیقی.

**١٥- (مار دیریا):**
(مطرافولیط بیث گەرمای) لە سەردەمی (مار ئابا جاثلیقی).

**١٦- (مار یۆحەنای چوارەم):**
لە سەردەمی یوسف جاثلیق (٥٥٢-٥٧٠)، لەم کاتدا قەدەغەی مەجوسەکان کرا بۆ باوەڕ هێنان بە مەسیحی و بڕیار درا دژی مەسیحییەکان بۆ پڕوپاگەندەو (تبشیر).

**١٧- (مار ئالاە زخا):**
مطرانی بیث گەرمای بوو لە سەردەمی جاثلیق (یوسف).

**١٨- مار سبریشوع:**
لەسەردەمی مار حزقیال جاثلیق لە ساڵی (٥٧٠- ٥٨١) ی زایینی لە سەردەمی ئەودا کولێرە بڵاوبووە لە کەرکوك و حدیاب و نەینەوا، ژمارییەکی زۆر خەڵکی کوشت.

**١٩- (مار بختشیوعی دووەم):**
لەسەردەمی جاثلیق ئیشو عیسابی یەکەم ئالارزنی (٥٨٢-٥٩٥)ی زایینی.

**٢٠- (مار شوحلماران):**
**٢١- (مار جبرئیل):**
**٢٢- (مار سبر یشوع):**
**٢٣- (مار هرمز):**
**٢٤- (مار جبرئیل راقوذا):**
**٢٥- مطرافولیطی بیث گەرمای کەناوی دیار نییە.**
**٢٦- ربان قریاقوس و کۆمەڵێك لە مطارنەی بیث گەرمای.**

**٢٧- (مارتوما):**
لە سەردەمی جاثلیق ئیبراهیمی دووەم مرجی (٨٣٧-٨٥٠) ی زایینی، هاو سەردەمی تۆما ئەسقەف مەرج بوو.

**٢٨- (مار تاو دروس):**
لە سەردەمی جاثلیق یوانیس بوو (٨٩٣-٨٩٩)ی زایینی.

**٢٩- (مار نەیشوع):**
**٣٠- (مار نسطورس):**
**٣١- (مەتران باجەرمی، ناوی دیار نییە).**
**٣٢- (مار عما نوئیل).**
**٣٣- (ماریا بالاها).**
**٣٤- (مارداود کوری برسها).**
**٣٥- (مار یۆحەنا).**
**٣٦- (مار تۆما).**

**٣٧- (مار عبد یشوع):**
ئامادەی هەڵبژاردنی جاثلیق برصوما صوباوی بوو لەنێوان ساڵانی (١١٣٤-١١٣٦)ی زایینی.

**٣٨- (مار إیلیا):**

**٣٩- (مار سبر یشوع):**

**٤٠- ربان ئیبراهیمی ساوفی:**
(١٤٣٧- ١٤٩٧)، لە سەردەمی بەتریرك شمعون (دمخابا صبیدی بوو)[٣٥]. ئەو ئەسقەفانەی کە لەوەو پێشەوە باسمان کرد هەر لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی مەسیحی بوو تا ناوەراستی سەدەی شانزەهەمی زایینی تا ئەوکاتەی وەفدی کەرکوك لەگەڵ موسڵ ئامادە بوون بۆ هەڵبژاردنی یوحەنا سولاق سەرۆکی دێری رەبان هەرمزدو ناردنی بۆ ڕۆما بۆ وێنەی بطریرکیە.

ئەوەی سەرنج دەدرێت مێژووەکان تەواو نییەو تارادەیەك چەوتەو تەواوی بەدەستەوە نادات لەبەر کەمی سەرچاوەو پچرپچری سەرچاوەکان.

*** بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام و دەوری بەسەر ئایینی مەسیحییەوە:**

قۆناغێکی تر گەشەی کرد، کە هەنگاوێکی نوێ بوو بۆ وەرچەرخاندنی ئایینی مەسیحی، چونکە هەنگاوەکانی ئەو گۆڕانە دەروازەیەکی نوێی کردەوە، کە هەم لایەنی چاك هەم لایەنی خراپی هەبوو.

بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، خۆی لە خۆیدا ئاڵا هەڵگری شۆڕشێك بوو، کە کۆڵەکەی چەند تایبەتمەندییەك بوو، کە وای دەرکرد ببێتە گۆڕانی ئەو ژینگەیەی کە ئایینی مەسیحی تێیدا گەشەی کردبوو، خستنەسەر باری ئەو ژینگەیە لە ململانێی ئەو ئایینە ئاسمانییەدا.

چۆن ئایینی ئیسلام خاوەن چەند تایبەتمەندییەکی دیاربوو، هەر بەهەمان جۆر ئایینی مەسیحیش خاوەن چەند تایبەتمەندییەکی خۆی بوو، دروست بوونی هەریەکە لەو دوو ئایینە لە دوو سەردەمی جیاوازدابوو، هەر یەکێکیان هەڵگری سەردەمێکی مێژوویی دیاربوون.

ئایینی ئیسلام لە سەردەمێکدا گەشەی کرد کە خاوەنی قۆناغێکی مێژوویی بوو، پێویستی بەوە دەکرد، مێژوویەکی هەمە لایەنی دروست بکات ببێتە راپێچی مێژوویی بۆ ئەو بارە تازەیە.

ئایینی مەسیحی کەوتە بەر کاری قۆناغێکی تاڵی مێژوویی، کە بووە بەرداشی نێوان سیاسەتی گەورەترین ئیمپراتۆریەتی ناوچەکە.

هەر بۆیە سەر هەڵدانی ئەم قۆناغەش تاقی کردنەوەییەکی تر بوو بۆ خۆ ئامادەکردنی مەسیحییەت بۆ پێشوازی ئەو ماوە مێژووییە.

سیاسەتی ساسانییەکان وای کرد کە ببێتە ئاستەنگێکی گەورە لە بەردەم پێگەیاندنی بنەماکانی گەشەکردن ئایینی مەسیحی، چونکە رێگەدانی ئیسلام لەگەڵ مەسیحییەکان هەنگاوێك بوو بۆ زووتر تاودانی سەردەمەکە.

هەر لە هەمان کاتدا ئایینی مەسیحی پێویستی بەوە هەبوو پێگەیاندنێکی بەرچاوی هەبێت، کە جێ پەنجەی خۆی بە دیار بخات، چونکە قۆناغەکانی لەوەو پێش تا ماوەی خۆشاردنەوەی سازدان بوو بۆ خۆئامادەکردن لەگەڵ سەردەمی ساسانییەکان، بەڵام ئەم ماوەیە پێویستی بەوە هەبوو بنەما ئایینییەکانی زیاتر بەدەربخات.

کاتێك ئایینی ئیسلام بڵاوبووە((دوا پاشای ساسانییەکان یەزدەگەری سێیەم بوو (٦٣٣-٦٥١)ی زایینی لەو کاتەدا کە هێزی ئیسلام بەرەو عێراق دەڕۆیی کە لە سەرەتاوە لە خوارووە دەستی پێ کرد.. بۆیە لە ناوچوونی یەزدەگەردی سێیەم کۆتایی دەوڵەتی ساسانییەکان بوو، ئیسلام هەموو ئەو ناوچانەی داگیر کرد کە لەژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ساسانییەکاندا بوو.. لە ساڵی (٧٢٨- ٧٢٩)دا ئەمیرێك کە ناوی (کیسرا) بوو لە نەوەی یەزدەگەری سێیەم هەستا بە رێکەوتنێك لەگەڵ تورکەکاندا بۆ گەڕاندنەوەی ئیمپراتۆریەتەکەی بەڵام سەری نەگرت..))[٣٦].

((..لە دوای داگیرکردنی ناوچەکانی خوارووی عێراق لەلایەن هێزی ئیسلامەوە.. عومەر کوڕی خەتاب وای دادەنا بۆ داگیرکردنی هەموو ناوچەکانی عێراق بە سەروو خوارووییەوە، داوای دەکرد کە زیاد لە سنووری ئەو ناوچانە نەڕۆن و تەنها ئەو ناوچانە بپارێزن کە پارێزگاری سنووریان دەکات لەگەڵ فورسەکاندا.

(بەلاذری) ئاوا باس دەکات:

کە (سەعد کوڕی وەقاس) هەستا بە ناردنی (هاشم کوڕی عەقەبە)و (ئەشعەس کوڕی کەندی)، بۆ داگیرکردنی ئەو ناوچانە، ڕۆیشت بە (راذانات)ی سەروو خواروو، دەوروبەری (عوزێم)، تا گەیشتە (داقوق)و (خانیجار- خورماتوو)وە توانییان سەرکەون بەسەر ئــەو ناوچانەو کوڕەی (باجرمی) (ناوچەی کەرکوك) رزگار بکەن، ..تا گەیشتنە ناوچەی شارەزوور..نەبوونی ناوی (مطرافولیطی) کەرکوك یان دەوری لە هاتنی ئیسلامدا چۆن بووە، هەروەها سەرچاوەکان شاراوەیە لەو ماوەیەدا لەو شارە، ئەوەی کە باسی هەیە بریتییە لە شێوەیەکی سەرپێی.

لە زنجیرەی مێژووی ئەسقەفەکانی کەرکوکدا لە کاتی هاتنی ئیسلام (جبرائیلی یەکەم)، ئەسقەفی شاری کەرکوك بووە، ئەم ئەسقەفە لە سەردەمی (ئەیدیشوعیاب ئەلجەدالی) بووە لەنێوان ساڵانی (٦٢٨-٦٤٥)ی زایینی.

بەڵام کەرکوك لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا بریتی بووە لە دێیەکی تا رادەیەك گەورە، ئەو گرنگییە مێژووییەی نەبووە وەکو شارەکانی (داقوق)و (هەولێر).. هەیبووە[٣٧].

مەسیحییەکان پێشوازی ئیسلامیان کرد لە عێراقداو بەرەو پیریانەوە هاتن، هەوڵی ئەوەیان دەدا کە رزگار کەریان بێت لە چەوساندنەوەی ساسانییەکان.

سیاسەتی موسڵمانەکان وا بوو کە رێگەیان داوە بە (اهل الذمة) بۆ ئەوەی کارە ئایینییەکانیان جێبەجێ بکەن، بەڵام لە بەرامبەر ئەوەدا (جزیە) بدەن و ببورێن لە کاری سەربازی، مەسیحییەکان سوودیان بینی لەم سیاسەتەو روویان کردە زانست و ئایینی و پزیشکی و دەسترەنگینی پیشەی جۆر بەجۆر.

لە پێش هاتنی ئیسلامدا نزیکەی (١٠٠) دێرو کڵێسەیان هەبوو، کە لەدوایی ئیسلامدا ئەم ژمارە زۆرە زیادی کردووە، لە کاتی هاتنی ئیسلامدا کڵێسەی نەستوریە لەنێوان دوو رووباردا (بین النهرین) بریتی بوو لە شەش ئەبرەشی بەم جۆرە:-

ئەبرەشی مەداین.

ئەبرەشی خوزستان.

ئەبرەشی نسێبین.

ئەبرەشی میسان (بەسرە).

ئەبرەشی حدیاب (هەولێر).

ئەبرەشی بیث گەرمای کە کەرکوك بنکەی ئەبرەشییەکە بوو[٣٨].

ئەوەی جێگەی سەرنجە دەربارەی ناوچەی کەرکوك ئەوەیە سەرچاوەکان لەبەر دەستدا کەمەو، ئاماژە بۆ چەند لایەنێکی سەرپێی ئەو ماوە مێژووییە دەکەن، شتێکی ئەوتۆ کەڵەکە نابێت تا بتوانین بە روویەکی راست، باسە

مێژووییەکان شیبکەینەوە.. بەڵام ئەو ڕاستییە یەکلا دەبێتەوە کە ناوچەی کەرکوك بەگشتی ئەبرەشییەکی گرنگی مطرافولیطی ئایینی مەسیحی بووە، ئەوەی کە دەبێت بڵێین ئەوەیە کەمی سەرچاوەکانەو گرنگی نەدان بە ناوچەکە.

ئەوەی گرنگە کە وای کردووە ناوچەی کەرکوك بە چاوێکی کەم سەیر بکرێت، ڕوودانی ئەو ئاژاوەو گێچەڵانە بوو کە لە سەردەمی ئەمەوی‌و عەباسی‌و عوسمانییەکاندا ڕوویدا، و پاداگرتنی کارەساتەکان لە ناوچەکانی کەرکوك کە شوێنێکی گرنگی ڕووداوەکان بوو، هەروەها کاولکردنی بەشێکی زۆری ناوچەکە، لەگەڵ خۆیدا بووە ڕاپێچی هەموو بنەما ئایینییەکانی ناوچەکەو قاودانی بە ڕووداوە سیاسییەکانی، پشت گوێ خستنی سروشتی کارە ئایینییەکانی بە شێوەیەکی ئاسایی.

باشترین نموونەی ئەم بۆچوونەمان ناوچەی (لاشوم) ە کە لە سەردەمی ئیسلامدا بە تەواوی هەرەسی هێناو گەلێك کەلەپوری مەسیحی تێدا سڕایەوە، کە ئەویش لە ناو بووەتەی کارەساتەکانی ئەو ڕووداوانەندا تووایەوە.

هەر لە بەر ئەمە بوو کار گەیشتە ئەوەی خەڵکەکە بە شێوەیەکی فراوان ناوچەکە چۆڵ بکەن‌و بەرەو شوێنێکی ئاسوودە تر ئارام بگرن بۆیە ئێستا تەنها پاشماوەیەکی کەلەپووری ئایینی مەسیحی چییە نەماوە لەو شارە.

((دەتوانین بە کورتی بڵێین، کە شێوازەکانی ڕێگەدان‌و کاری چاکە، جیاوازی هەبوو لەنێوان پاشاکانی ئیسلام‌و سەردەمەکان‌و ڕووداوە سیاسییەکانی نێوان موسڵمانەکان‌و (اهل الذمة) لەلایەك‌و موسڵمان‌و دەوڵەتەکانی دراوسێ، وەکو بێزنتییەکان لەلایەکی ترەوە.

سەردەمی ئەمەوییەکان دادەنرێت بە ماوەی گەورەیی‌و دەست بڵاوی‌و ڕابواردن‌و شەو ئاهەنگ گێڕان، کە وای لێ هات ئایین پشت گوێ خراو بایەخیان زیاتر بە ڕوووکەشەکانی دەرەوە دەداو لە ئایین بەرزتر دەیان نرخاند، هەر ئەمە وای کرد موسڵمانەکان بێزار بن لێیان‌و هەوڵی ڕووخاندنیان بدەن، کار گەیشتە ئەوەی لە سەردەمی پاشاکانی دواییان بە تەواوەتی تووشی بەد ڕەوشتی بوون[٣٩].

بەڵام لە سەردەمی عەباسییەکاندا هەستیان بە خۆشییەك کردو بەبەر خۆیاندا هاتنەوەو، بووە هۆی فراوان بوونی کارە هونەرییەکانی عەباسییەکان کە پێویستی بەوە دەکرد، خەڵکانی کارامە لە هەموو چینەکان بۆ فراوانی دەوڵەتەکەیان، کە مەسیحییەکان بەشێکی گرنگی ئەو خەڵکانە بوون لە خزمەت کردنی کارە بەڕێوەبەرییەکانی دەوڵەتەکەدا[٤٠].

لە سەردەمی خەلیفە (موعتەسەم)دا، (٨٣٣-٨٤٢)ی زایینی پایتەختی لە بەغداوە گواستەوە بۆ سامەڕاو (ماری) وا وەسپی ئەو ماوەیە دەکات کە گوایە چۆن ئاسوودەیی باڵی بەسەر ناوچەکانی (موسڵ)و (باجەرمی)دا گرتبوو[٤١]. کە کەرکوك بەشێکی گرنگی ئەو ئاسودەیە بوو.

بەڵام ئەگەر سەیری هەندێك لە ماوە مێژووییەکانی مەغۆڵی‌و تەیموری وتەتەرەکان بکەین دەبینین کە کڵێسەو ئایینی مەسیحی تووشی نووچ دان‌و ڕووخاندن‌و کوشتن‌و بڕین‌و لەناودان بوو، کە تا کۆتایی سەدەی پانزەهەمی خایاند))[٤٢].

((ئەگەر سەیری ماوەی عوسمانییەکان بکەین دەبینین بریتی بووە لە ڕقێتی سیاسەت‌و پوکانەوەی ڕۆشنبیری‌و دەمارگیری ئایینی و سیاسەتی ڕێکخستنی (طوائف)، کە ئەمە وای لە مەسیحییەکان کرد ڕوو بکەنە دەوڵەتەکانی ڕۆژئاوا بۆ پارێزگاری کردنیان لە سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی، هەر ئەمەبوو هەندێك هەنگاونرا بۆ یەکخستنەوەی کڵێسەی ڕۆژهەلات لەگەڵ ڕۆما))[٤٣]. تا بەوەی ببێتە پارێزگاری کردنیان لە سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی.

لەبەر ئەمەیە کە وای کرد سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی ببێتە ئاستەنگێکی گەورە لەبەردەم ئایینەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەکان‌و وای لێ بێت هەموو چین‌و توێژەکانی بکاتە دوژمنی یەکتری.

دەبینین ئەگەر کڵێسەیەك ئاوەدان کرابێت یان دروست کرابێت پەیوەست بە کاری سیاسەتی نێوان ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوای دەوڵەتەکان بووە.

*** ئەسقەفەکانی ناوچەی کەرکوك لەنێوان ساڵانی ١٧٨٩-١٩١٧:**

١. (**قەس ئەبراهم**):

٢. (**مار ئیبراهیم ١٧٨٩-١٧٩٣**):

مەتران بوو لەسەر ئەبرەشی کەرکوك ئەمە بەردەوام بوو لە کەرکوك تا بەوەی لادرا بەهۆی ئاژاوەی لەگەڵ (مار یۆحەنا هرمزد)، دوای ئەوە ئەبرەشییەکە بە چۆڵی مایەوە، ئەویش بەهۆی پشت گوێ خستنی لەلایەن (مار یۆحەنا هرمز)، سەرچاوەکان وا باس دەکەن (مار ئیبراهیم) لە (جەزیرە) کۆچی دوای کردووە.

٣. (**مار لورنسیوس شوعا ١٨٢٦-١٨٥٣**):

وێنەی مەترانی ئەبرەشی کەرکوکی کێشاوە لەدوای کۆچی شوانی ئەبرەشییەکە، ناوی دیار نییە.

٤. (**قەس ئەندراوس**):

لە دوای (مار لورنسیوس) کرایە مەترانی ئەبرەشییەکە، بەڵام لەدوایدا بیری دانانی گۆڕا ئەویش لەبەر ئەوەی لەوانەیە خەڵکی کەرکوك نیازی دانانی (یۆحەنا تمرز)یان بوو بێت.

٥. (**مار شمعون سە نجاری**):

لەدوای لادانی (قەس ئەنداروسی) کرایە مەترانی ئەبرەشی کەرکوك بەڵام دانرا بەمەترانی ئەبرەشییەی (کەرکوك)و (سنە)، ئەو دژی ئەمە وەستا لەبەر دووری هەردوو ناوچەکە چونکە کەرکوك لە عێراق بوو (سنە) لە ئێران بوو، ئینجا بڕیاردرا بە جیاکردنەوەی هەردوو ئەبرەشییەکە، (مار شمعون سەنجاری) کرایە ئەبرەشی (سنە)و (ئەبرەشی)، کەرکوك (مار یۆحەنا تمرز) کرایە مەترانی شارەکە لە ساڵی (١٨٥٤)ی زایینی.

٦. (مار یۆحەنا تمرزی تلکیفی ١٨٥٤-١٨٨١):
یەکێکە لە راهیبەکانی هرمزدییەکان، وێنەی کێشراوە لەلایەن بەتریك (یوسف ئۆدۆ) لە ساڵی (١٨٤٧- ١٨٧٨) بۆ مەترانێتی ئەبرەشی کەرکوك.

لەساڵی ١٣ی ئەیلول (١٨٨١) داکۆچی دوای کرد، دوای ئەوەی نیو سەدە ژیانی بەرێ کرد لە ئەبرەشییەی کەرکوك، لە کڵێسەی (أم الأحزان) لە قەڵا لە کەرکوك نێژرا کەهەستا، بە دروست کردنی لە ساڵی (١٨٦٢)ی زایینی لەسەر پاشماوەی کڵێسەیەکی کۆنتر لەوەی تر، دووبارە تازە کرایەوە لە ساڵی (١٩٦٥) بە ناوی کڵێسەی (العذراء مریم) لەسەر ئەرکی خێزانی (ئیبراهیم قۆڵچی) بە ناوی (ئاکابی ئەکتادیۆس جرجیان) کە بێوەژن بوو.

٧. (مار عبد یشوعی خەیات):
لە دوای (مار یۆحەنا تمرز) هاتووەتە سەر بەتریکی ئەبرەشی کەرکوك.

٨. (قەس یعقوب نعموی کلدانی ١٨٨٢):
لەدوای (مار عبد یشوع) سەرۆکایەتی ئەبرەشی کەرکوکی گرتە دەست بەڵام دوای ماوەیەك وازی هێنا.

٩. (مار جبرائیل نادمۆی موسلی ١٨٨٣-١٨٩٩):
یەکێکە لە قوتابییەکانی کۆلێژی بڵاوبوونەوەی باوەڕ لە رۆما ساڵی ١٨٨٣ (مار عەبد یۆنان) داینا بە ئەبرەشی کەرکوك بەڵام لە ساڵی (١٨٩٩)دا، کۆچی دوای کرد کە توانی ئەبرەشییەکەی بۆ ماوەی شانزە ساڵ بەڕێوە بەرێت، لە کڵێسەی (أم الأحزان) لە قەڵای کەرکوك نێژراوە.
لە دوای خۆی قەس (ئەدی شیری) شەقەڵاوەیی دانرا تا دانانی یەکێك بۆ ئەبرەشییەکە.

١٠. (مار یوسف ئیلیا خەیاتی بەغدادی ١٩٠٠-١٩٠٣):
لە ساڵی (١٩٠٠) بووەتە شوانی ئەبرەشی کەرکوك و لە کڵێسەی (أم الأحزان) لەقەڵا نێژراوە.

١١. (تۆدور مسیح ١٩٠٤-١٩١٧):
خۆری تۆ دوور بەغدادییە، وێنەی مەترانی کێشاوە لەسەر دەستی بەتریریك (مار عمانوئیلی دووەم تۆما) لەسەر ئەبرەشی کەرکوك لە رۆژی یەك شەممە ١٦ی تشرینی یەکەم ساڵی ١٩٠٤ بە یارمەتی مەتران (ئەستیفان جەبری)، جێگری بتریریکی و مەتران (پۆلسی دانیالی سریانی) جێگری مەترانی موسڵ، وا باس دەکەن لە دەوڵەمەندی و شوێنی چاوتێری، خوانی هەردەم ئاوەدان بووە، یارمەتی لێ قەوماوانی هەردەم باسکراوە، لە ٢٦ی ئایار، ساڵی ١٩١٧ دا کۆچی دوای کردووە لە کاتدرائیەی (أم الأحزان) نێژدراوە[٤٤].

* رووداوە مێژووییەکانی سەردەمی هاتنی ئینگلیزەکان لە ناوچەی کەرکوکدا:
هاتنی ئینگلیزەکان و داگیرکردنی ناوچەکە لەلایانەوە، هەنگاوێك بوو بۆ چەسپاندنی هەموو بنەماکانی داگیرکردن چونکە ئەوان زیاتر بەرەو بەرژەوندی سیاسی خۆیان دەڕۆیشتن و هەنگاوەکانیان لەو قاوغەوە دەست پێ دەکرد، گوێیان نەدەدایە نەتەوەو ئایین و بنەماکانی نێودەوڵەتی. یەکێك لەو خاڵە گرنگانەی هەوڵیان بۆ دەدا خاڵی نەتەوەو ئایینی بوو، تێدەکۆشان بۆ ئەوەی ئەو خەڵکانە لە دوو خاڵەوە قاڵ بدەن و بیانەوێت بیکەنە قوربانی سیاسەتی دەوڵەتی ناوچەکە.
هیچ کاتێك نەیانویستووە ئایین ونەتەوە لە بارێکی سروشتیدا گەشە بکات، هەربۆیە لە سەردەمی ئینگلیزەکاندا هەموو نەتەوەکان بوونە قوربانی رێکەوتن نامەی (سیڤەر) و (لۆزان) زۆر کەس لەوانەی کە تاکو ئێستا لە رووداوە مێژووییەکان ناگەن، کاری تاوان دەکەنە سەر (سمکۆی شەکاك) دەربارەی کوشتنی (مار شمعون)، بەڵام ئەگەر بە رووداوەکاندا رۆ بچینەخوارەوە، ئەو راستییە خۆی قوت دەکاتەوە کە گوایە هەریەکە لە (سمکۆی شەکاك)و (مار شمعون) قوربانی سیاسەتی ئینگلیزەکان و بەرداشی ئەو سیاسەتە چەوتەن، بۆیە ئەگەر مێژوو بنووسینەوە دەبێت بە چاوی رووداوەکانی ئەو کاتەوە سەیر بکرێت.. نەك بە روانگەیەکی کوورت بینانەوە بۆ رووداوەکان بچین.
ئەگەر سەیری ناوچەیەکی وەکو کەرکوك بکەین دەبینین گەلێك رووداوی لەوەی (مار شمعون)و (سمکۆی شەکاکی) تێدا روویدا کە هەمووی لە ئەستۆی سیاسەتە چەوتەکەی ئینگلیزدا خۆی قووت دەکردەوە.
یەکێك لەو رووداونەی کە لەو ماوەیەدا رووی دا دەست درێژی هێزی (لیڤی) بەسەر خەڵکی کەرکوك دا هەوڵی دەست درێژیان بەسەر گەرماوی ژناندا، دەگەڕێتەوە ساڵی (١٩٢٤) دا، کە بەم جۆرەیە.
((چەند کەسێك لەهێزی (لیڤی) لە (تیاری)یەکان دەچنە ناو بازاری کەرکوك بۆ شت کرین لە رۆژی چواری مانگی ئایاری ١٩٢٤، یەکێك لەوانە لەگەڵ خەڵکانی شارەکە دەبێتە ناخۆشییان لەسەر نرخی شتەکان، لەئەنجامی ناخۆشی و شەڕدا، یەکێکیان بریندار دەبێت، ئەوانەی تریش رادەکەنەوە بۆ مۆڵگەکانیان و داوای یارمەتی لە برادەرەکانیان دەکەن بۆ تۆڵە کردنەوەو جۆرەها ئامرازی پێویستی چەك لەگەڵ خۆیان دەهێنن، دەکەونە کوشتنی خەڵك لەهەر کوێیەك دێتە پێشیان، پۆلیس هەوڵی رێگە گرتنیان دەگرن دەیانکوژن بۆیە بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرکوك (موراد رەحمەتوڵڵا کوری موبارك) لەسەر داوای ئەفسەری بەریتانیا رێگەی هێزی پۆلیس دەگرێت بۆ بەرەنگاربوونەوە، ئەمیش وادەکات لە خەڵکی کەرکوك خۆیان بەرگری لە خۆیان بکەن، دەست درێژی کەران دەچنە ماڵە مەسیحییەکان بۆ بەرگری کردن لە خۆیان و ژمارەیەکی زۆر لە کوژراو و بریندار هەبوو کە خۆی لە دووسەد کەس دەدا.

بەڵام کاتێك هۆزەکانی دەوروبەری کەرکوك بەمەیان زانی هەستان بە کۆبوونەوەیان بۆ تۆڵەسەندنەوەی لە تاوانباران بۆیە (مندوب سامی) بەریتانی بەڵێنیدا بە دەرکردنی تاوانباران لە شارەکەو ناردنیان بۆ چەمچەماڵ، بەیانێکیان دەرکرد بۆ ڕاگرتنی ئارامیی و سزای دەستدرێژی کەران و باربووی کوژراوەکان بکرێت[٤٥].

هەر لە هەمان ڕۆژدا هەستان بە هێرش کردنیان بۆ سەر گەرماوی ئافرەتانی موسڵمان لەلای قەڵا، ئەویش تەنها بۆ ئەوەی ئاژاوەیەکی خوێناوی لەنێوان موسڵمان و برا مەسیحییەکان بنێنەوە، بەڵام هەریەکە لە (عەلی بەستێ)و (عەبدوڵڵا چیمەنی) ڕێگەیان لێ دەگرن ونایەڵن خۆیان بکەن بە گەرماوەکەدا بۆ ئیشی بەد ڕەوشتی.

لێرەدا چەند سەرنجێکی مێژووییانە خۆی قووت دەکاتەوە:

١. بەهۆی سزا نەدانی لە بازاڕی (القمة)ی موسڵ دا کردیان لە ڕۆژی (١٥)ی ئابی ساڵی (١٩٢٣) وای کرد هەوای دەست درێژی بیان گرێت وبەهەمان شێوە ئەم کارە لە کەرکوکدا دووبارە بکەنەوە.

٢. ئەگەر سەیری هەردوو ناوچەی (موسڵ)و (کەرکوك) بکەین دەبینین کەرووداوەکان لە خۆڕا نەبووە بەڵکو نەخشەی بۆ دانراوە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە لەبەر ئەوەی ڕێژەیەکی زۆر هەیە لەمەسیحی و موسڵمان، تا بەوەی ئاژاوە لەنێوانیان دروست بکەن.

٣. ڕێگە نەدان بە هێزی پۆلیسی شارەکە لەلایەن ئینگلیزەوە مانای ئەوەیە بەفیتی خۆیان ئەم کارە کراوە.

٤. گۆڕینی موتەسەریفی کەرکوك ( فەتاح بەگ)، دانانی سەرۆکی شارەوانی (عەبدولمەجید یەعقوبی) بەموتەسەریفی کەرکوك بەڵگەیەکی ڕاستە بۆ لایەنگیری خۆیان.

٥. هەرچەندەکە حکومەتی بەریتانیا، بەڵێنی سزا دانانی تاوانبارانیدا، بەڵام هیچ شتێکی لەو جۆرەی نەکردوو وردە وردە لەبیرکرا.

٦. هەروەها لە خودی خۆیدا ویستی کە ئاژاوەیەکی مەزهەبی لە ناوچەکە دروست بکات لەنێوان برا مەسیحییەکان تا بەوەی ئەوانیش چەکدار بکات بۆ مەرامەکانی خۆیان.

٧. ئەگەر سەیری ئەو ماوەیە بکەین کە فەرمانڕەوایی عێراقیان کرد.. شتێکی ئەوتۆ نابینین کە لە خزمەتی برا مەسیحییەکاندا بوو بێت، ئەوەی کە بەرچاو دەکەوێت تەنها لە بەرژەوەندی ئامانجەکانی خۆیاندا بووە.

٨. هەوڵدانیان بۆ پێشوازی مەسیحییەکان بۆ ئەوەبوو بکرێنە دەسکەلایەکی سیاسیی و هەمووی قاڵ بدەنە نێو هێزی (لیڤی)یەوە، هەوڵی باڵا دەستی ئاسوری بکەن بەسەر مەزهەبەکانی ترەوە.. لەنێو خودی مەسیحییەکان خۆیدا.

*** ئەسقەفەکانی ناوچەی کەرکووك لەنێوان ساڵانی ( ١٩١٧- ٢٠٠١ )دا :**

١- **مار ئەستیفان جەبری موسڵی** ( ١٩١٨- ١٩٥٣ )

لە ساڵی (١٨٧٢) لە شاری موسڵ لە دایکبووە وێنەی قەسی کێشاوە لە ساڵی (١٨٩٤) لەسەر دەستی (مار عەبۆی یۆنانی) بە ناوی قەس جەبری و بووە بە مەتران، لە (٣٠)ی تشرین دووەمی ساڵی (١٩٠٢) لەسەر دەستی بەتریرك مار یوسف عەمانوئیلی دووەم بە ناوی ئەستیفان جەبری، ئینجا هاتووەتە ئەبرەشی کەرکوك و سلێمانی و هەولێرو بووە بە سەرۆکی ئەبرەشییەکان لە (٣١)ی ئابی (١٩١٧).

لە دوای ئەوی بروانامەی شاهانەی وەرگرتووە لە هەر یەکە لە (ئەدی شیر)و (یەعقوب ئۆجین حەنا) لە سەردەمی سوڵتان ڕەشاد لە (١٥)ی ئاداری ساڵی (١٩١٨)هاتووەتە کەرکووك.

گەشاوەترین سەردەمی شوێنی مەترانەکەی بووە ئەویش لەبەر پیرۆزی، غیرەت و ئازایەتی هەڵسوراندنی کاروبارەکانی. پیاوێکی ئازاو دڵفراوان و پاك و بەرێز بووە، کە جێگەی باوەڕی خەڵکی کەرکووك بووە.

لە ڕۆژی (١٩)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٣)دا کۆچی دوایی کردووە، لە کاتدرائیەی (ام الاحزان) لە قەڵا نێژراوە، لە دوا کاتەکانی ژیانیدا هەریەکە لە ئەبرەشییەکانی کەرکووك و هەولێرو سلێمانی پێکهاتبوون لە زیاتر لە دەهەزار خاوەن باوەڕ و دوانزە کاهن و نۆ کڵێسە.

٢- ( **مارئەفرام کوکی سەعرتی** ) ( ١٩٥٤- ١٩٥٦ )

وێنەی کاهینی لە (٢٧)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩١٥)دا لەسەر دەستی مار یوسف عەما نئێلی دووەم کێشاوە، لە ساڵی (١٩٣٤)دا هاتووەتە کەرکووك، کە بووە بە مامۆستای قوتابخانەی (طاهرة)ی کوران ئینجا لە دواییدا بووەتە بەڕێوەبەری، وێنەی مەترانی کێشاوە لەسەر ئەبرەشی کەرکووك لەسەر دەستی مار یوسف غیمە (١٩٤٧- ١٩٥٤).

بەرووخۆشی و دڵفراوانی شاردنەوەی نهێنی بەناوبانگ بووەو خۆشەویست بووە لای گەورەو بچووك، ئارەزووی لە کۆکردنەوەی پولی پۆستە بووە، لە ڕۆژی (٢٦)ی ئاداری ساڵی (١٩٥٦)دا بە نەخۆشی دڵ کۆچی دوایی کردووەو لە کاتدرائیەی (ام الاحزان) لە قەڵا نێژراوە، خانووەکەی کردە (وەقف) بۆ کۆمەڵەکەی لە کەرکووك. لە دوای خۆی (روفائیل بیداوید) کاروباری ئەبرەشییەکەی گرتووەتە ئەستۆ.

٣- ( **ڕافائیل ڕەبان ئەلسەنگی** ) ( ١٩٥٧- ١٩٦٧ )

قوتابی (مجمع انتشار الایمان)بووە، وێنەی ئەسقەفی کێشاوە لە ساڵی (١٩٤٧) لەسەر دەستی ئەستیفان جەبری لەسەر ئەبرەشی عەمادییە، بەڵام لەسەر ئارەزووی خۆی گوازراوەتەوە بۆ کەرکووك لەبەر ئەوەی ئاووهەوای عەمادیەی بەدڵ نەبووە، لە ساڵی (١٩٦٧)دا کۆچی دوایی کردووەو لە کڵێسەی (العذراء الجدید) لە قۆریە نێژراوە کە خۆی دروستیکردووە، لە دوای خۆی یوسف قریاقوسی کەرکووکی جێگەی ئەبرەشییەکەی گرتووە، بەڵام بەهۆی دانانی مەتران یوسف قودا لە ساڵی (١٩٦٨)دا لەسەر

ئەبرەشییەکە، بۆ ئەبرەشی بەغداد گوێزراوتەوە، لە ساڵی (١٩٧٨)دا کۆچی دوایی کردووە، تەرمەکەی هێنرایەوە بۆ کەرکوك و لە کڵێسە (مەریەم العذراء) نێژراوە.

**٤- (کوریال قودا الالقوشی – ١٩٦٨- ١٩٧٧).**

لە ساڵی (١٩٦٨) هاتووەتە ئەبرەشی کەرکووك لە تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٧٧)دا خانەنشینکراوە.

**٥- (مارئەندراوس حەنا) (١٩٧٨)**

لە (٢٦)ی کانوونی یەکەم (١٩٧٧) هەڵبژێردراوە بە مەترانی ئەبرەشی کەرکووك و کاروبارەکانی بەجێهێناوە[٤٦]. بەڵام ماوەی کارەکەی دیار نییە هەر لە ڕۆژی (یەکی کانوونی دووەم ساڵی ١٩٧٨)ەوە چارەنووسی کارەکەی نادیارە.

**٦- (ئەندراوس جەجوحەنا) (١٩٧٨- ٢٠٠١)**

مەتران ئەندراوس لە ساڵی (١٩٧٨)وە هاتووەتە سەر ئەبرەشی کەرکوك، تاکو ساڵی ٢٠٠١ بەردەوام بووە[٤٧].

*** مێژووی کڵێسەکان لە ڕووی دابەش بوونی ئایینزاوە (مذهب):**

کاریگەری گۆڕانە سیاسییەکان لە ناوچەکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی، کاری خۆی کردە سەر ڕێچکەکانی ئایینی مەسیحی.. لەگەڵ خۆیدا بووە دروست بوونی جۆرەها ئایینزا (مذهب)، بۆ شیکردنەوەی ئایینەکە، لە گەڵێك باردا دەورە سیاسییەکە باڵا دەستی خۆی دروست کردووە بە سەریەوەو هەنگاوەکان وای کردووە بەرەو دابەش بوونی کڵێسەی بەرێت و لەنێوان کڵێسەی ڕۆژهەڵات و کڵێسەی ڕۆژئاوادا جۆرەها ئایینزا خۆی قووت کردۆتەوە.

کڵێسەی مەسیحی لە ڕۆژهەڵات پێکهاتووە لەژێر پارێزگاری و دەسەڵاتی ئیمپراتۆر، لەدوای دابەشکردنی ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی بۆ ڕۆژئاوایی کە بنکەی ڕۆما بوو، بۆ ڕۆژهەڵاتی کە بنکەکەی قوستەنتینیە لە ساڵی (٣٦٤) ی زایینی، کە ئەمە بووە بەهێزی شانی (باڵی) کڵێسەی مەسیحی لەبەشی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، کەوای لێ هات خودی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی خۆی هەڵدەستا بە هەڵبژاردنی بتریاریکی قوستەنتینیە[٤٨].

کڵێسەی مەسیحی لەسەرەتادا، پێش دابەش بوونە ناوخۆییەکانی، پێکهاتبوو لەچوار کورسی کڵێسەیی وەکو ئەنتاکی و ئەسکەندەری وڕۆمانی و قوستەنتینی، گەورەترین کورسی کورسی ئەنتاکی بوو، کەپێکهاتبوو لە هەموو ئاسیا، دەسەڵاتی هەبوو بەسەر هەموو ڕۆژهەڵاتی مەسیحییەوە بە جیاوازی هەموو ڕەگەزەکانییەوە.. بۆیە سنووری درێژەی کێشا لە هەموو ئاسیا تاکو هیند[٤٩].

ووده ووده لەگەڵ جیابوونەوەی کڵێسەی ڕۆژهەڵاتی تایبەت مەندی خۆی وەرگرت و وای لێ هات ببێتە بنکەیەکی گرنگی ئایینی مەسیحی.

یەکەم جیابوونەوەیەکی گەورە لە کڵێسەی مەسیحیدا ڕوویدا سەرهەڵدانی بیروباوەڕی نەستووری بوو، ئەویش دەگەڕێتەوە سەر دامەزرێنەری (نستوریۆس)، کە ئیمپراتۆر (سیئۆدوسیوس)ی دووەم لە ساڵی (٤٢٨)ی زایینی داینا بەبەتریرکی قوستەنتینیەوە، بیروباوەڕەکانی نەستوریۆس وای بۆ دەچێت کە مەسیح بریتییە لە دوو خودی (شخصیە) جیاواز (ئەقنۆمین) ئەویش ئەقنۆمی مرۆڤ کە (یسوع)ەو ئەقنۆمی (خوا)، ناتوانین بڵێین کە (مریەم العذراء) دایکی خوایە، بەڵکو وەکو مرۆڤەوەو، (مەسیح) لەدایکبووە وەکو خودێکی مرۆڤی و هەروەها مردووەو لە خاچ دراوە وەکو مرۆڤ[٥٠].

دەبینین لە دوای ماوەیەك، نەستورییەکان کاریگەرییەکی گەورەیان کردە سەر ئایینی مەسیحی و وایان لێ هات ژمارەیەکی زۆریان لەدەوری خۆیان کۆکردەوە[٥١].

لە ساڵی (٤٣١)ی زایینی لە کۆنگرەی (ئەیفیسی)دا بڕیاری ئەویان دا بەسەر نەستورییەکان کە گوایە تێکدەرن و نەستۆریۆسیان لە ئەسقەفی قوستەنتینیە دەرکرد، هەرچەند ئەسقەفی ئەنتاکییە لایەنگیری بوو بەڵام (سیریل) بەترێرکی ئەسکەندەریەو لایەنگرانی و مەتارنەکانی ڕۆما دژی نەستۆریۆسی وەستان و لایەنگیری بیروباوەڕەکانی خۆیان بوون دەربارەی ئەوەی کە (مەسیح) یەك سروشتێکی هەیە، کە ئەو کۆمەڵەیە ناسراون بە (منۆفیسیتین)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وای کرد نەستۆرییەکان ژمارەیەکی زۆریان لە دەرەوەی خۆیان کۆکردەوەو بوو بە کارتێکردنێکی گەورە لەسەر کڵێسەی مەسیحی.

وای لێ هات شاری سلوقیە لە عێراق جێگەی (رەها)و (نصیبین)ی گرتەوەو بوو بە گرنگترین بنکەی بڵاوبوونەوەی نەستوری، نەستورییەکان هەوڵی ڕۆیشتنیان دەدا لەگەڵ سیاسەتی فارسەکان.. ئەمە وای کرد ناوچەیەکی زۆریان داگیرکردو لایەنگیرانی تێدا بڵاوبووە بۆ سەرهەڵدانی بیروڕای نەستووری.

هەروەها نەستوورییەکان لایەنگیری هاتنی موسڵمانەکانیان کردوو بەرەو پێشوازییان ڕۆیشتن و گەلێك نامە گۆڕینەوە هەبوو لەگەڵ پێغەمبەر (محەمەد) دا (درودی خوای لێ)، ئەم سەربەستییەیان درێژەی کێشا هەتا هێرشەکانی مەغۆل لە سەردەمی جەنگیزخان لە سەدەی سیانزەو چواردەمی زایینی.

لە دوای ئەو ماوەیە وای لێهات ژمارەیەکی زۆریان شوێنەکانی خۆیان بەجێ هێڵن و ڕابکەن لە دەست هێرشی مەغۆلەکان، هەندێکیان ڕۆیشتوون بۆ (قوبرس)و (هیند)و هەندێکی تر خۆیان گەیاندۆتە چیایەکانی کوردستان.

بڵاوبوونەوەی (موبەشیر)ە کاسۆلیکییەکان لەو ماوەیە کارتێکردنێکی گەورەی کردە سەر نەستورییەکان و لایەنگیریانی زۆر کەم کردوەو بڵاوبوونەوەیانی ڕاگرت، تەنها ئەوانە مانەوە لە چیاکان کە لە دوایدا ناسران بە نەستورییە کلدانییەکان[٥٢].

لێرەدا دەتوانین بڵێین چەند ڕێبازو بروایەك هەیە وەکو کاسۆلیك، کە زۆربەی کریستانی (مەسیحی) لەسەر ئەم باوەڕەن و بریتین لە کلدانی و سریانی کە لەسەر یەك ڕێبازو بڕوان. جگە لە کاسۆلیك، نەستوری و یاقوبی، ئەمانیش یەك زمان و بروا، یەك نوێژیان هەیە، بەڵام سریانی لەتەك یاقوبیدا جیاوازن، کلدانی و سریانی کاسۆلیکن، سەر بە ڕۆماو پاپان، بیروباوەڕیان یەکە. نەستوری، نوێژو باوەڕیان

وەکو کلدانەو زمانی ئایینیان ئارامییە، تەنها نەستۆریۆس. جیاوازی هەیە لەتەك كاسۆلیكی خاوەریدا.

(مەسیح) لە باوەڕی کاسۆلیکیدا وشەی خودایە، تەن و بەدەنی بۆ پەیدا بووە بە هێزی ڕەوانی پیرۆز، بێ ئارەزووی پیاو لە مەریەمی کچ بووە، ئەم خۆییەش، خوداییەو ووتەی خودایەو دوو سروشتی هەیە، یەکەمیان مەردومی، کە تواناو کرداری مەردومی هەیەو ئازار ئەدرێ وەکو مەردوم دووەم سروشتی، خودایە، لەبەر ئەوەی ئازار نادرێو خوداییە، لەبەر ئەوەی دوورە لە کردەوەی مەردومەوەو نیشانەو سەرسامی دەنوێنێت.

نەستوری دەڵێت:-

سروشت بە بێ خۆی نابێت (ئەقنوم)، ووشەیەکی یۆنانییە، لەبەر ئەمە مەسیح دوو خۆیی هەیەو لە دوو سروشت دایە، مەردومێکی ئاوێتەیەو لەبەر ئەم باوەڕە بێ بەری کراوە.

(یاقوبی) دەڵێ:-

چونکە مەسیح یەك خۆییەو یەك سروشتەو تێکەڵ لەگەڵ سروشتی خودایی و مەردومییە.

ئەگەر سەیری ناوچەیەکی وەکو کەرکوك بکەین، دەبینین بێ بەری نەبووەو کەوتۆتە ژێر کاریگەری گۆڕانە مەزهەبییەکان و دوورو نزیك سەر هەڵدانی لە ناوچەدا چەکەرەی کردووە، بەڵام ئەگەر ئێستا سەیری بکەین کاریگەری نەستووری و یەعقوبی زۆر بە کەمی ڕەگی تێدا ماوە، ڕێژەیەکی بەرچاو هەیە کلدانی- کاسۆلیکین(٥٣).

*** کڵێسەی کاسۆلیکییەکان:**

**١. کڵێسەی کلدانی:**

ئەبرەشییەی (کرخ سلوخ)، دروست بووە هەر لە سەردەمی نەوەکانی پێشوودا، سەرۆکی ئەسقەفەکان هاتوونەتە سەر ئەم کورسییە تا ساڵی (١٥٥٢)ی زایینی، لەژێر چاودێری کاسۆلیکێتی دووبارە لە ساڵی (١٧٨٩)ی زایینی دروست کراوەتەوە، لە ساڵی (١٩٦٨)ی زایینی ناوچەی هەولێری لێ دابراوەو بووەتە ئەبرەشییەکی سەربەخۆ، سلێمانی بووە جێگری بەتریرکی، زنجیرەیەك مەتارنەی هاتووەتە سەر حوکم کە شوێنیان لە قەڵا بووە لە ژێر چاودێری کاتدارئیەی (ام الحزینة)، کە ئێستا پاشماوەی نەماوەو ڕووخاوە، بەهۆی هەرەسی ژێری قەڵا.

لە کەرکوکدا سێ کڵێسەی کلدانی هەیە:-

وەکو کڵێسەی (مریم العذراء)و (مار یوسف)و (قلب یسوع الاقدس)، نزیك مەترانییە، لەگەڵ پاشماوەی کڵێسەیەکی کۆن بە ناوی کڵێسەی (مار تەهمەزگرد)، بە ناوی کڵێسە سوورەکە، سەرۆکی ئەبرەشیەکە لەم سەردەمەدا (مار ئەندراوس سەنا ئەلسامی)یە، کە هەر لە ساڵی (١٩٧٧) ەوە بەڕێوەی دەبات کە چوار (کاهن) یارمەتی دەدەن لە کارەکانیدا، هەروەها لە کەرکوکدا دێری (راهبات الکلدان) یش هەیە. سەر بە ئەمانەن(٥٤).

بە ناوبانگترین مەتارنەکانی بریتییە لە:-

(مار یۆحەنا تمرز ١٨٥٤- ١٨٨١)، مار جبرائیل ئادمۆ (١٨٨٣- ١٨٩٩)، مار ئەسستیفان جەبری (١٩١٨- ١٩٥٣)، بە ناوبانگترین (کاهن)ەکانیان قەس مەتران (ئەدی شیر)، کە خزمەتی کردووە لەنێوان ساڵانی (١٨٨٩- ١٩٠٢)ی زایینی.

سنووری ئەم ئەبرەشییە، سنووری پارێزگای کەرکوکە، ژمارەی باوەڕ هێنەرەکانی نزیکەی (٥٠٠٠) هەزار کەس دەبێت، کە هەموویان لە ناو شاری کەرکوك نیشتەجێن کە یەك خۆرنەو (٣) کاهن و (٣) کڵێسە بەسەر ئەم ئەبرەشییەیە.

ئەم ئەبرەشییە بنکەیەکی هەیە بۆ فێربوونی مەسیحییەت کە ژمارەیەکی زۆر قوتابی هەیە لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن، لەگەڵ چاوپێکەوتنی هەفتانە بۆ لێکۆڵینەوەی کتێبی پیرۆز (ئینجیل)، وەزری (طقس) جۆر بە جۆر، لەگەڵ بوونی کتێبخانەیەکی دەوڵەمەند(٥٥).

**٢. کڵێسەی سریانی کاسۆلیکی:**

ئەم ئەبرەشییە لە ناوچەکانی کوردستاندا بڵاوبووەتەوە وەکو: (موسڵ)و (قەرەقوش)و (بەرتەلە)و (بعشیقە)و (سەنجار)و (کەرکوك)، لە ناوچەی کەرکوك کڵێسەیەك و کاهنێکی هەیە(٥٦).

*** کڵێسەی ئەرمەنی کاسۆلیکی:**

ژمارەی باوەڕکەرانی ئەم ئەبرەشەیە (٢١٨٠) کەس دەبێت، کە دابەش بوونە لەنێوان شارەکانی، بەغدا، بەسرە، سنجار، موسڵ، کەرکوك، ئەم ئەبرەشییە سێ کاهن و دوو کڵێسەی هەیە(٥٧).

*** کڵێسەکانی ڕۆژهەڵاتی نەستووری:**

ئەم کڵێسانە دەگەڕێتەوە بۆ دوو مژدەبەر (مار ئابادی)و قوتابییەکەی (مار ماری)، کە دادەنرێت بە یەکەم بەتریرکی کڵێسەی ڕۆژهەڵاتی. کە کڵێسە لەنێوان دوو ڕووباردا شەش ئەبرەشی (میطرفولیطی) هەبوو، کە دابەشکرابوو هەریەکەیان بە چەند بنکەیەکی ئەسقەفی، کە سێیان لە (بابل)و سێیان لە ئاشوردایە.

ئەبرەشییەکانی (بابل)و (میشان)و (ئەهواز)و (بیث لاباط)، (بیث گرمای)، کە بنکەکەیان (کەرخ سلوخ) بوو لە کەرکوك، ئەبرەشی (حدیاب) بنکەکەی لە هەولێر بوو، ئەبرەشی (بیث عربایی)، بنکەکەی لە (نصیبین) بوو.

ئەبرەشی کەرکوك، کڵێسەو کاهینێکی هەیە.

ئەم کڵێسانە لە دوای هاتنی ئیسلامدا، بە تایبەتی لەکاتی فەرمانڕەوایی عەباسییەکاندا سنووریان زۆر فراوان بوو، لە کۆتایی سەدەی دەیەمدا، نزیکە (١٥) بنکەی (میطرافولیطی) هەبوو، بەڵام لە کاتی هێرشەکانی هۆلاکۆدا تووشی هەرەس هێنان و ڕووخاندن بوو.

*** بەتریرکی کڵێسەی مژدەبەری جاثلیقی کۆن:**
**ئەم کڵێسەیە سێ ئەبرەشی هەیە، ئەوانیش بریتین:-**

لە ئەبرەشی بەغداو ئەبرەشی کەرکوك‌و ئەبرەشی موسڵ پارێزەری ئەبرەشی کەرکوك وا باسی دەکات:-

ئەم ئەبرەشییە لەساڵی (١٩٧٠) دامەزراوە، کەبریتییە لە پارێزگاکانی سلێمانی‌و کەرکوك، ژمارەی باوەڕکارانی (٢٠٤٥) کەسە، هەر یەکێك کاهینێکیان هەیە چەند شەماسەیەك یارمەتییان دەدات، ئەم ئەبرەشییە، یەك پەرستگای هەیە، کە تایبەتە بە فێرکردنی قوتابیانی کوڕو کچ، لە کاتی پشووی هاویندا، بۆ فێربوونی باری ئایینی‌و زمان‌و ئاوازی (طقس)[٥٨].

*** کڵێسەی سریانی ئەرثـــەدۆکس:**

**١. کڵێسەی سریانی ئەرثـــەدۆکس:**

دروست بوونی ئەمە دەگەڕێتەوە سەدەی شەشەم (لە ئەبرەشی موسل)، کاروبارەکانی وەستا لە ساڵی (٦٢٨)ی زایینی، لە دوایدا مەترانەکەی ناسراوە بە ناونیشانی (مەتران دێرمارتی)و (نەینەوا)و (موسڵ) بنکەکەی لە دێرەکەیدا بووە، کە لە ساڵی (١١٥٣)دا بووەتە بنکەی مەترانەی ڕۆژهەڵات، لە سەدەی هەژدەهەم ئەبرەشییەی (دێرمارتی) لێ دابراوە.

ژمارەی خێزانە باوەڕ پێکراوەکانی لە موسڵ (٩٠٠-٩٥٠) کەسە، کە سێ کاهن لە پێنج کڵێسەدا خزمەتی دەکات، لە کەرکوکدا ژمارەی باوەڕ پێکراوەکانی (١٠٠) کەسەو، یارمەتییان دەدات کاهینێك‌و کڵێسەیەك، لە قەرەقووش (٤٩)کەسەو، کاهینێك‌و سێ کڵێسە خزمەتیان دەکات لەگەڵ کڵێسەی شەهید شەمونی، لەگەڵ هەندێك خێزان لە (سەنجار) و (هەولێر)و سلێمانی).

**٢. کڵێسەی ئەرمەنی ئەرثـــەدۆکس:**

ژمارەی ئەرمەنەکان لەسەرتاپای عێراقدا (٢٠٠,٠٠٠) هەزار کەسە، کە (١٤,٠٠٠) هەزار کەسیان لە بەغدادو ژمارەکەی تریان لە چوار بنکە بڵاوبوونەتەوە، وەکو (بەسرە، موسڵ، کەرکوك، زاخۆ)، یارمەتی دەریان (٤) کاهینن، کە سیانی لە بەغدایەو یەکێکی لە موسڵە.

بۆیە وەکو کڵێسە لە ناوچەی کەرکوکدا نییەو، تەنها وەکو خێزان بڵاوبوونەتەوە.

**٣. کڵێسەی ئەقبات ئەرثـــەدۆکس:**

ئەمە ئەو کاتە سەری هەڵدا، لە کاتی هاتنی ژمارەیەکی زۆری کارمەندو کرێکاری میسرییەکان لەم بیست ساڵەی دوایدا، کە ژمارەیان خۆی دەدا لە حەوت هەزار کەس، ژمارەیەکی زۆریان لە (بەغدا)و (موسڵ)و (کەرکوك)و (بەسرا) بڵاوبوونەتەوە، کە خزمەتیان دەکات (قمص میصاك الآنبا بشوی). ڕۆژێك لە مانگێکدا کارە ئایینییەکانیان دەکەن لە کڵێسەی (الطاهرة) لە موسڵ کە هی سریانی ئەرثـــەدۆکسن[٥٩].

*** کڵێسەکانی ئە نجیلیە:-**

**١. کڵێسەی پرۆتستانتی ئە نجیلی نیشتمانی:-**

ئەم کڵێسەیەی ئەنجیلیە سێ کڵێسەی هەیە لە بەغدا کە ژمارەیان (٣٥٠)خێزانە، لە بەسرە (١٠٠) خێزانەو لە کەرکوك (٢٠) خێزانە، لە خزمەتیاندا سێ پارێزەر هەیە، لەسەر پەرستگایەکەوە لە (موسڵ) کە پارێزەری نییە، ئەم چوار کڵێسەیە هەر چواری سەربەخۆیەو، هیچ پەیوەندییەکی نییە بە دەرەوەو لە ژێر کارتێکردنی هیچ دەستەو تاقمێکی ئایینییەوە نییە، لەبەر ئەوەی کڵێسەیەکی نیشتمانییە لەڕووی کارگێڕی‌و دارایی‌و ڕوحییەوە.

ئاوا قەس (حلیم توفیق) پارێزەری کڵێسەی ئەنجیلیە لە بەغدا باسی دروست بوونی کۆمەڵەی پرۆتستانت لە عێراق دەکات، کە دەگەڕێتەوە ساڵی (١٨٠٠)ی زایینی، ئەوەیش لە دوای بڵاوبوونەوەی بزاڤی چاککردن لە سەدەی شانزەهەم‌و کاری کردە سەر هەموو وڵاتەکانی عەرەبی‌و هەتا گەیشتە (عێراق)، سەرەتا بریتی بووە لەو خێزانانەی (موسڵ)، ئینجا فراوان بووە، هەتا گەیشتە بەغداو بەسرەو کەرکوك.

ئێستا لە ناوچەی کەرکوکدا کڵێسەیەکیان هەیە، کە خزمەتی بیست خێزان دەکات، پارێزەرێکیان هەیە بۆ بەڕێوەبەری کارەکانیان.

*** کۆمەڵەی ئەدفەنتستی سبتینی ئە نجیلیە:**

سەرەتای هاتنی ئەم کۆمەڵەیە لە عێراق دەگەڕێتەوە سەرەتای سەدەی بیست، لەو کاتەی (مبشر)ەکان لە سەرەتادا هەستان بە دروست کردنی نەخۆشخانەی (دار السلام) لە بەغدا، ئینجا کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتایی‌و ناوەندیی‌و ئامادەیی، بایەخ دان بە جموجوڵیان بۆ هەموو ناوچەکانی تر (شیخ غانم فتوحی فرجو) سەرۆکی کۆمەڵەکە وا باس دەکات کە چوار کڵێسەیان هەیە لە عێراقدا ئەوەیش لە (بەغدا)و (موسڵ)و (کەرکوك)و (بەسرە)، کە چوار قەس پارێزگاری دەکات، کە سیانیان عێراقی‌و یەکێکیان لوبنانییە ناوی قەس (شەفیق سرور)، کە پارێزگاری کڵێسەی بەغدا دەکات[٦٠].

*** کچەکانی مەریەمی کلدانییەکان - راهبات العذراء المحبول بها بلا دنس:**

ئەمانە ناسراون بە (کچە ڕاهیبەکانی کلدان)، دروست بوونی دەگەڕێتەوە سەر ڕەهبەنەی بەتریرکی لە بەغدا لە (٧)ی ئاب (١٩٢٢) لەژێر دەستی بەتریرك مار یوسف عما نوئێلی دووەم، لەگەڵ پشتگیری خۆری ئەسقەف (ئەنتوان زبونی).

ئامانجی ئەم ڕەهبەنەیە پێگەیاندنی لاوانە لە ڕێگای قوتابخانەوە، کارکردن بە ڕێگای مژدەبەری (رسولی) لە خۆرنەکانی کلدانی.

ئەم ڕەهبانییە ئێستا بیست‌و پێنج بنکەی هەیە، کە حەوت بنکەی لە بەغدا هەیە، ئەوانەی تری هەریەکە لە

(بەسرە)و (کەرکوك)و (هەولێر)و (موسڵ)و (کرمیلیس) و (قۆش)و (دهۆك)و (زاخۆ)و (کوێت)و (سوریا)و (تاران)و (ڕۆما)، لەگەڵ چوار بنکە لە وڵاتە یەکگرتوەکان و دوو بنکە لە ئیمارات (دوبەی و شارقە).

ئەم خوشکانە کاریان لە قوتابخانە یان لە چالاکی خۆرنەیە یان لە ڕۆشنبیرێتی مەسیحییەتە لە کڵێسەکاندا، ژمارەی کچە ڕاهیبەکان (٩٥) کچە ڕاهیبەیە، دەست پێکەریان (١١) کەسەو کچە قوتابیان پێنجەو، ئارەزوومەندیان (٤٠) کەسە، سەرۆکی ئێستایان خوشکە (بنینیا هرمز شکوان)ە[٦١].

*** نموونەیەك لە کڵێسەکانی سەرەتاکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی:**

**١. دێر یوسف:**

دەڵێن گوایە لە کاتی هاتنی (ئەدی)و (ماری)بۆ (کەرخ سلوخ)، یوسف ناوێك باوەری بە ئایینەکە هێناوەو دێرێکی دروست کردووە بە ناوی (دێر یوسف).

**٢. کڵێسەی توتریتی:**

هەستا بە دانانی گەلێك یاسا بۆ بەرێوەبەری ئەم کڵێسەیە، لەدوای ئەوە ئەسقەف (یوحەنا) کڵێسەکەی تازە کردۆتەوە.

**٣. کڵێسەی (صاصا):**

ئەمە وەکو خانوویەك دروست کرابوو، بۆ شوێنی پەرستن، کە کاتی دروست کردنەکەی لە ماوەی چل ساڵانی چەوسانەوەکە بوو.

**٤. کڵێسەی (عقبالاها):**

ئەمە لە دوای باوکی، هەستا بە دروست کردنی ئەم کڵێسەیەو (معنا) هەموو پێویستییەکی دا بۆ سەر گرتنی ئەم کڵێسەیەوە: کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لە بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی لە ناوچەی (تشینی- تسعین)[٦٢].

لەوانەیە ژمارەیەکی زۆر کڵێسەو دێر دروست کرابێت، بەڵام سەرچاوە نییە، کە باسی دروست کردن و ناوی ئەو شوێنانە بکات، ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو چەوسانەوانەی کە تووشیان بووە.

((ئەوەی ڕاستی بێت لەسەر مێژووی سەرەتاکانی بیناکاری داگیر کردنی ئیسلام لە ناوچەی کەرکوکدا زانیاریمان زۆر کەمە شتێکی ئەوتۆمان بە دەستەوە نییە، تا بتوانین ڕوونی ئەو لایەنە یەك لا بکەینەوە، ئەوەی بەدەستمان گەیشتووە دەگەڕێتەوە سەردەمی عومەری کوری خەتاب دووەم خەلیفەی ئیسلام. بەڵام ئەوەی کە دەیزانین دەربارەی ئەوەی، گوایە موسڵمانەکان (عەرەبەکان)، لەسەرەتادا هونەری بیناکاریان نەبووەو لە ناوچەکانی تری کە داگیریان کردووە فێری هونەری بیناکاری و نەخش و نیگار بوونە، چونکە شتێکی ئەوتۆ نەدۆزراوەتەوە لە نیمچە دوورگەی عەرەب کە جێگەی باسی ئەم ڕاستییە بێت.

یەکەم کارێك کە موسڵمانەکان پێی هەڵسان لە هونەری بیناکاری بریتی بووە لە دابین کردنی شوێنێك بۆ نوێژکردن، بۆیە هەوڵیان داوە ئەو شوێنانەی کە پیرۆز بووە لەلای خەڵکی ناوچەکە بیکەنە بنکەی ئەو نوێژکردنە، کار گەیشتۆتە ئەوەی کە گوێیان بە شێوەی بیناکارییەکەی نەداوە، تەنها بیریان لە داگیرکردنی شوێنەکە کردۆتەوە، شوێنی نوێژکردنی هەر هەمان شوێنی بیناکاری پێش خۆیەتی و گۆڕینێکی کەم ڕووی داوە، ئەوەیش گۆڕینەکە لە سەرەتادا لە شێوەی بیناکارییەکە نەبوو، بەڵکو هەستاون بە تێکدانی چەند لایەنێکی نەخش و نیگارو کۆتەڵی شوێنەکە، کە نموونەی ئەمە هونەری (ئەیقۆنات)و کۆتەڵ و وێنەی مرۆڤییە.

ئەوەی سەرەنج ڕادەکێشێت ئەوەیە کە ناوچەی کەرکوك، زۆری هونەری بیناکارییەکانی لە بنەڕەتدا کڵێسە بوونەو کراونەتە مزگەوت، وەکو مزگەوتی (گەورە- عوریان)و چینەکانی ژێرەوەی مزگەوتی داقوق و چینەکانی ژێرەوەی پێغەمبەر دانیال و چینی ژێرەوەی مەرقەدی (زین العابدین) لە داقوق.

((سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوەی دەکەن کە وەختی خۆی چینی ژێرەوەی پێغەمبەر دانیال کڵێسە بووە کراوەتە مزگەوت و مزگەوتەکەش چەند جارێك چاك کراوەو دەستی پێدا هێنراوە، کە لە بنەڕەتدا کڵێسەی (مار دانیال کلباس) بووەو لە کاتی هاتنی ئیسلامدا ئەمە هەبووەو شوێنی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی بووە، لەوانەیە پاشماوەکانی ئێستا لە ئاستی کۆڵانەکانی دەورووبەر بووبێت.

وا بڵاوە کە بنکەی ژێرەوەی کڵێسە بووەو لە دوایدا سێجاری تر تازە کراوەتەوە لە سەر چینەکەی ژێرەوە.

مزگەوتی گەورە کە پێی دەڵێن (ئۆلو جامیع) یان (مەریم ئانا) یان (مەریەمانە)، بەپێی زمانی ناوخۆیی مەسیحییەکانی کەرکوك دەگەڕێتەوە بۆ یادی (پاکیزە مەریم)، لە چینی ژێرەوەی دیواری ئەم مزگەوتە توانرا کە (ئەیقۆنات) یان وێنەی پاکیزە بدۆزرێتەوە، لەگەڵ دۆزینەوەی پاشماوەی تر وەکو ماڵی شەهیدەکان، لەژێر زەمینێکی فراوانی تاریك کە بەڵگەیە لە بوونی ئەوەی شوێنی کڵێسە دەکات.

لێکۆڵەری ئەڵمانی (هرتسفیلد) وای بۆ دەچێت لە بنەڕەتدا کڵێسە بووبێت ئەوش لە شێوەی نەخشەکێشانی و هونەری بەناییەکەیدا[٦٣].

دەڵێن گوایە لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوری خەتاب، ئاوەدان کراوەتەوە لەسەر کڵێسەکە تا ئێستا پاشماوەی بە ڕوونی دیارە.

لەسەردەمی سیانزەهەمی زایینی دووبارە تازەکراوەتەوە، کەرەستەی بیناکارییەکەی پێکهاتووە لەبەردو گەچ و کەوانەو گرێ و گومەت، میحرابەکەی دەڕوانێتە سەر بیناکارێکی شێوە لاکێشەیی چەماوە کە وەکو سەرپشتی ماسی وایە، وەکو ئەوەی باوبووە لە دروست کردنی کڵێسەدا[٦٤].

لە کتێبی (تقویم قدیم للکنیسة الکلدانیة النسطوریة) دا واباسی هاتووە بە بوونی کڵێسەیەك لە کەرکوك بە ناوی (مەریم بەتول)ە لەنێوان ساڵانی (١٠٠٠- ١٧٠٠)ی زایینی.

پاشماوەی ئەم مزگەوتە شتێکی ئەوتۆی نەماوە تەنها بریتییە لە گوومەت و بانگۆکەی، کە دەڵێن گوایە بەهۆی هەورە تریشقەوە لە ناو چووە[٦٥].

*** كڵێسەی (مەریم العذراء):**

لە پارچەیەكی مەرمەڕی چەسپ كراوە لەسەر ڕووی دیواری خواڕووی كڵێسەكە بە نوسراوی كلدانی ئاوا باسی دروست كردنەكەی دەكات:

((ئەم كڵێسە كلدانیە دروست كراوە لەسەر ناوی (مەریەم البتول المحبول بها بلا دنس)، لە سەردەمی پاپا بیۆسی نۆیەمو بەتریریك یوسف ئودرو (مطرافولیط)، یوحەنا تمرز، لە ساڵی (١٨٦٢)ی زایینی)).

لەسەر پارچە زەوییەك دروست كراوە، كە بەخشراوە لەلایەن باوەڕپێكراو (كۆركیس ئوراها) یەكێكە لە دانشتوانی دێی قۆریەی كۆن كە ئێستا یەكێكە لە گەڕەكەكانی كەركوك، لە دووری دوو كیلۆمەتر لە قەڵاوە، ڕوووبەری ئەم كڵێسەیە (١٤٠٨)مەتر دووجایە، بنمیچەكەی بە دوو حەوزی شێوە كەوانەیی گرێ دراوە بە بەردو گەچ، كە لەسەر چوار كۆڵەكەی مەرمەڕی ڕاوەستاوە، لەسەر هەردوو شوێنی قوربانییەكەی (مذبح) دوو گومەتی بەرزی قوچەكی لەسەرە، كە ناوەوە بێبەش نییە لە هونەری نەخشو نیگار.

لە ساڵی (١٩٢٤)ی زایینی، لە كاتی هاتنە ژوورەوەی ئینگلیزەكان بۆ ناوچەی كەركوك، بەهۆی ئەو بشێوەییەی كە لە ناوچەكەدا ڕوویدا وای لێ هات كە خەڵكەكە ناوچەكە بەجێ بهێڵنو بڕۆنە قەڵا، ئەمە وای لێهات كڵێسەكە پشت گوێ بخرێتو ببێتە شوێنی بەستنەوەی ئاژەڵانو بكرێتە تەویلە، ئەم جارەش سێ مانگی خایاند ئینجا دووبارە گەڕاونەتەوەو، كڵێسەكە ئاوەدان كراوەتەوە.. كاهنەكانی خزمەتی خۆیان كردووە لە خزمەت كردنی ئەم كڵێسەیە تا ساڵی (١٩٦٥)ی زایینی.. لە دوای ئەو مێژووە، هەستان بە دروست كردنی كڵێسەیەكی تر لە تەنیشتیەوە، دووبارە لە ساڵی (١٩٧٨) ئاوەدان كراوەتەوە. ئەم كڵێسەیە شوێنێكی گرنگی گەشتو گوزارەو ڕۆژی هەینی ژمارەیەكی زۆری خەڵك سەری لێدەدەن[٦٦].

*** كڵێسە سوورەكە- (تەهمزگرد):**

ئەم كڵێسەیە لەسەر گردێكی بەرز دروست كراوە، كە بەناوبانگە بە گردی (مار تەهمەزگرد)، كەوتۆتە نێوان ئەو گردو شیوانەی كە لەو ناوچەیە هەیە، بە هۆی یادی ئەو ڕۆژەی كە ١٢ هەزار كەس شەهید بوون، (مار مارۆن) كە یۆحەنایی سێیەمە، لە ساڵی (٤٧٠)ی زایینی مەترانی كەركوك بووە، هەستا بە دروست كردنی دێرێك لەو ناوچەیە، لە دوایدا بوو بە كڵێسەی (مار تەهمەزگرد)، پێی دەڵێن كڵێسە سوورەكە، ئەویش بەهۆی ئەو ڕەنگە سوورەی ناوچەكەی داپۆشی بوو لە كاتی شەهید بوونیاندا.

لە كۆمەڵەی پاپەوی جاثلیقی دا لە ساڵی (٤٥٧- ٤٨٤) ی زایینی بڕیاری دانانی جێژنی ساڵانە بۆ ئەو پۆڵە شەهیدە دانرا لە ماوەی سێ ڕۆژدا، كە دەكاتە ڕۆژەكانی هەینیو شەممەو یەك شەمە، دەكەوێتە هەفتەی شەشەمی ڕۆژووی مژدەبران (صوم الرسل)، ئەویش لەسەر ئەسقەفەكانی (بیث گرمای)و (حدیاب).

ئەم كڵێسەیە لە شەڕی جیهانی یەكەمدا، شوێنی شاردنەوەی تەقەمەنی سوپای عوسمانییەكان بووە، لە كاتی كشانەوەیان لە شاری كەركوك لە ساڵی (١٩١٨)دا هەستان بە تەقاندنەوەی ئەم كڵێسەیەو فەوتاندنی ئەوەی تێدا هەبوو، تا بەوەی دووژمن نەتوانێت دەست بگرێت بەسەریدا. بەڵام لە دوای ئەم ڕووخاندنە دووبارە دروست كراوەتەوە لەلایەن وەستا (ئەلیاس عیسی)، بەو شێوەیەی كە ئێستا هەیە، لەسەر باربووی خۆی لە ساڵی (١٩٢٣)ی زایینی لە كاتی مەتران (ئەستیفان جبری)، ئەمەیش وای لێهات تەرزی كڵێسەكە بگۆردرێت بە قەبارەو شێوازی نەخشە كێشانەكەی.

ئەم كڵێسەیە زۆر ئاوەدان بوو لەنێوان ئەو سیو پێنج كڵێسەیەی كە هەبووە لە ناوچەكە لە كۆتایی سەدەی شانزەهەم، ئەوەیش لەو نامەیەدا هاتووە كە بتریك ئیلیلی هەشتەم لە ساڵی (١٦٠٧)ی زایینی پێشكەشی (قداسە) پاپا پۆلیسی پێنجەمی كردووە دەربارەی دارایی دەستەكەی (طائفة) ئەوەی لە خزمەتی ئەم كڵێسەیەدا بە ناوبانگ بووە بریتی بووە لە (قەس)، یوسف كەركوكی عەنكاوەیی لە نیوەی سەدەی هەژدەهەم[٦٧].

*** كارتدرائی أم الأحزان:**

نووسراوێكی كۆنی سریانی ئاوا باسی دروست كردنی ئەم كارتدارئییە دەكات:

((ئەم كڵێسەیە دروست كراوە لە قەڵای سلوخ (كەركوك) لە ساڵی (١٨٥٦)ی زایینی لەدایكبوونی مەسیح، بە ناوێكی پیرۆز ئەویش (الأم الحزینة)، لە سەردەمی باوكی گەورە پاپا پیۆسی نۆیەم، ئەسقەفی ڕۆماو هەموو مەسیحیو مار یوسف ئودۆی جاثلیقی بەتریریكی كلدانو مار یوحەنا تمرزی سەرۆكی ئەسقەفەكانی كەركوك (سلوخ)و ناوچەكانی.

هەموو ئەم كۆمەڵە هەستاون بەم كارە چاكەو لەگەڵ هەموو سەرۆك ئەسقەفەكان، لەگەڵ توانای پیاو چاكو بەترس لە خوا لە وڵاتی (طوقات)، (خواجا یوسف طرف باشی)، كە هەستا بە دانانی چارەكی ئەو پارەیە بۆ ئەم كڵێسەیە.

بۆ زانیاری پارەی خەرج كراو لە دروست كردنی ئەم كڵێسەیە (لە سەرەتاوە تا كۆتایی) پانزە هەزار (١٥,٠٠٠) چەرخی بووە كە بە پارەی ئەستەمبوڵ دەكاتە سیو حەوت هەزار (٣٧,٠٠٠) قرشی، ژمارەیەكی زۆر لە باوەڕ پێكراوان هەر یەكە بە پێی پێویستی خۆی كاری كردووە لە دروستكردنیدا[٦٨].

وەكو لە سەرچاوەكاندا بەدەردەكەوێت ئەم كڵێسەیە چەند جارێك چاك كراوەتەوە، ئەویش ساڵانی (١٨٦٢)، ساڵانی (١٩٠٤- ١٩٠٦)، تا لە ساڵی (١٩٦٥)دا بە تەواوی ڕووخاوە، هەروەها لەنێوان ساڵانی (١٩٧٩- ١٩٨٠) دووبارە دەستی پێدا هێنراوە، بەڵام بە كەڵكی چاكردنەوە نەهاتووە.

لە سەردەمی (تیۆدۆر مەسیح)، (١٩٠٤- ١٩١٧)دا دوووبارە دەست كراوە بە چاكردنەوەی، لە سەر پاشماوەی كڵێسە كۆنەكە، بەڵام لەو سەردەمەدا هیچ (مراسیم)ێكی ئاینی نەگێردراوە، ئەویش بە هۆی داگیركردنی دەسەڵات دارانی عوسمانیو كردنی ئەم كڵێسەیە بە نەخۆشخانەی

سەربازی سوپاکەیان.

ئەوەی بەشداری کردووە لەم چاککردنەوەیە بریتییە لە هەریەکە لە: وەستا یوسف و کورەکانی و یەعقوب و ئەیوب و وەستا رەزووق (کە لە بنەرەتدا خەڵکی موسڵن) لەگەڵ کورەکانیان (ئالتون عابۆ)و (لۆقا)و (عابۆ)، لەگەڵ وەستا (رزق اللە عددۆ)و (رزوق ئەبح) لەگەڵ شەماس (کرابیت یوسف)، لە کاتی ئیش کردندا یەکێك مردووە، بەهۆی رووخاندنی یەکێك لە دیوارەکانی کڵێسەکە ئەویش، (تۆزو ئۆغلو عیسا) بووە، کە رەنجێکی زۆری داوە لە دروست کردنی کڵێسەیەدا، بە تایبەتی گومەتە بەرزەکەی، لە دوای چەند ساڵێك ناقوسێکی گەورەی لەسەر بورجەکەی داناوە، بەڵام کاتێك ئەم کڵێسەیە رووخاوە ناقوسی ئەم کڵێسەیە گوێزراوەتەوە بۆ کڵێسەی (مەریم العذراء)ی تازە لە گەرەکی قۆریە..))[٦٩].

بە پێی ئەو پشکنینانەی کە لەم کڵێسەیەدا کراوە وا بە دەردەکەوێت گەلێك گۆڕینی تێدا کراوە بە تایبەتی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، ئەویش بە زیادکردنی و لێکردنەوەی بەشێکی کڵێسەکە، ئەوەی ماوە ئێستا تەنها بریتییە لە هەیکەلی کڵێسەو، سێ ژووری بچووك کە داڕووخاندن لە ناوی داوە، حەوشەیەکی ناوەکی بچووکی هەیە، کە دەڕوانێتە سەر ڕارەوێکی پان کە کۆتایی دێت بۆ لای دەروازەی سەرەکی کڵێسەکە، ئەم دەروازەیەش هەر وەکو ئەوانەی تر گۆڕینی بەسەردا هاتووەو لە شێوە بنەرەتییەکەی لای داوە.

هەیکەلی کاتدرائیەکە پێکهاتووە لە هۆڵێکی لاکێشەیی گەورە، لەگەڵ سێ گوومەت لە شێوەی نالی ئەسپ گومەتەکەی ناوەراست گەورەترە لە هەردوو گومەتەکەی ئەم لاو ئەولا، کە لە ناوەوە راوەستاوە بە هۆی ڕیزێکی کۆڵەکەی نیوە بازنەیی کە سنگەکەی بریتییە لە مەرمەر، راوەستاوە لەسەر کۆڵەکەی خر لە هەمان بەرد کە پێوانەکەی (٧٧) سانتیمەترە، نەخش و نیگاری تیجانی هەیە.

بەرامبەر ئەم کۆڵەکانە، نیوە کۆڵەکەی تر هەیە، کە شێوە خرە لە رووی دیوارەکە، کە هەریەکەیان کەوانەیەکی لە مەرمەر دروست کراوی هەڵگرتووە، بەڵام بچووکترە لەوانەی یەکەم، هەندێك لەم نیوە کۆڵەکانە شێوەیەکی لاکێشەیی هەیە بە تایبەتی ئەوانەی ئەملاو ئەولای دەروازەکەی کە دەروات بۆلای هەیکەلەکە، لەسەر ئەم نیوە کۆڵەکانەوە کۆڵەکەی گەچی دیار هەیە.

لە سنگی هەیکەلەکەدا، چینێك مەرمەر داڕێژراوە لەسەر زەوییەکە، بە بەرزی سی سانتیمەترو لەسەریەوە، دوای ماوەیەك لە پێشی ڕێژکراوێکی تر، تەنها بەشێکی کەمی لێ دۆزراوەتەوە لە گۆڕەپانەکەدا، لەسەر درێژی لای سەرووی رۆژهەڵاتی بنمیچێکی گرێ (عقود)داری هەیە، دروست کراوە لەبەردو گەچ، لەبەردەمەوە راوەستاوە لەسەر سێ کەوانەیی نیوە بازنەیی، کە راوەستاوە لەسەر کۆڵەکەی لاکێشەیی کە تیجانی نییە، کۆتایی دێت بە چینێك نەخش و نیگاری سادەیی، ئەم کۆڵەکانە لەگەڵ کەوانەکان گشتی کەوتوون[٧٠].

*** کڵێسەی یوسف:**

ئەم کڵێسەیە ئێستا نەماوە، شوێنەکەی کراوەتە مزگەوتی موسڵمانەکان، ئەویش پاش ئەوەی زەوییەکانی (وەقف) کراوە، بەڵام چەند لایەکی کۆنی ماوە کە تاکو ئێستاکە لەناو مزگەوتەکە پارێزراوە، شوێنەکەی بەرامبەر (افران ڤیڤیان)ە بێجگە لەم کڵێسانەی کە باسمان کرد، گەلێك کڵێسەو دێری تر هەیە، بەڵام شوێنەواریان نەماوە.

*** ئەو کڵێسانەی ئێستا لە کەرکوکدا هەن بریتین لەمانەی خوارەوە:**

١. کاتدرائیە (مار یوسف).
٢. کڵێسەی (قلب یسوع).
٣. کڵێسەی (مەریم عذراء).
٤. کڵێسەی (العائلة المقدسة للسریان الکاثولیك).
٥. کڵێسەی (مار أفرام للسریان الارثـدوکس).
٦. کڵێسەی (مار گورگیس للاثوریین).
٧. کڵێسەی (جاثالیقیەی) کۆن.
٨. کڵێسەی (ئەرمەنی ئەرثـەدۆکس).
٩. کڵێسەی (ئەنجیلیەی نیشتیمانی).
١٠. کاتدرائییە لە سێکانیان





ئەندۆراس سەنا



ئەفرام کوکی



مەتران ئیستیفیان جەبری سەرۆکی ئەساقیفەی کەرکوك و هەولێرو سلێمانی



یوسف خەیات

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:-

١- مجلة الفكر المسيحي، السنة الثالثة عشر، ساڵی (١٩٧٧) لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (لمحات في تاريخ الكنسية في بلاد مابين النهرين) لاپەرە: ٢٩٥.

٢- كنيسه المشرق (١) الفجر الاصيل، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە: ٦٧.

٣- مجلة بين النهرين، ژمارە (٩١- ٩٢)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە: ٢٤٤.

٤- اربيل في أدوارها التأريخية، دراسة تأريخية عامة لأربيل وانحائها منذ اقدم العصور حتى الحرب العالمية الأولى، زبير بلال اسماعيل، مطبعة النعمان، النجف، ١٩٧١، لاپەرە: ١١٥.

٥- شهداء المشرق، الاب البير ابونا، الجزء الاول بغداد، ١٩٨٥، لاپەرە: ٢٠- ٢٢. العماد: یەکێکە لەو دابونەریتانەی کە لە ئاینی مەسیحیدا هەیە، بۆ پاککردنەوەی مرۆڤ لە تاوانەکانی و هەوڵدانە بۆ دانانی ڕێو شوێنی ڕزگارکردن لێی، لە سەرەتای سەدەکانی یەکەمی بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحیدا کاری پاککردنەوەی (التعميد)، لەو شوێنانە دەکرا کە نزیکی سەرچاوەی ئاوو ڕووبار بوون یا لە نزیکی دەریاو دەریاچەکان. بەڵام لە دوای ئەوەی مەسیحییەکان توانای دروستکردنی کڵێسەو دێریان هەبوو، ئەم دابونەریتە ئایینییە گوێزرایەوە بۆ نێو کڵێسەکانو شوێنێکی دیاریکراوی بۆ دانراو گەلێك پێویستی ئەو کارراییەی بۆ دامەزرا، بۆ زیاتر بڕوانە: مجلة بين النهرين، ژمارە (٩١- ٩٢) هەمان سەرچاوەی، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (زيارة بيت العماد في كنيسة المشرق، نووسینی الاب د. جاك اسحق)، لاپەرە: ٢٤٢.

٦- دراسات كردية حول بلاد سوبارتو، د. جمال رشيد احمد، لاپەرە، ١٠٨.

٧- مجلة الاخاء، ژمارە (٧- ٨) ١٩٨١، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (كركوك ومحلة خاصة)، روفائيل ميناس، لاپەرە: ٢١- ٢٥.

٨- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٣٤٠- ٣٤١.

٩- كنيسه المشرق (١)، الفجر الاصيل، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە: ٢٥٩.

١٠- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٣٤٢.

١١- تاريخ الكنيسة السريانية الشرقية، الاب البير ابونا، الجزء الاول، لاپەرە: ٢٥٩.

١٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە: ٢٥- ٢٦.

١٣- كنيسة المشرق (١٩) الفجر الاصيل، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە: ٣٤٥٩.

١٤- تاريخ كنيسة السريانية الشرقية، الجزء الاول لاپەرە: ٢٦.

١٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە: ٢٧- ٢٨٩.

١٦- كنيسة المشرق، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە: ٣٤٥.

١٧- تاريخ كنيسة السريانية الشرقية، هەمان سەرچاوەی پێشوو. لاپەرە: ٣٧- ٣٨- ٣٩. لە بۆچوونی مەسیحییەوە وایان پێدەوترێت.

١٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە: ٣٩- ٤٠.

١٩- مجلة الاخاء، ژمارە (٧- ٨)، ١٩٨١، كركوك، محلة خاصة روفائيل ميناس، لاپەرە: ٢١.

٢٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە: ٢٥٩.

٢١- مجلة الفكر المسيحي، العدد ٢١٦، السنة الثانية والعشرون، حزيران، ١٩٨٦، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (مزار سلطان مهدوخت في اردان، نجيب فاتو) لاپەرە: ٢١٦.

٢٢- شهداء المشرق، الاب البير ابونا، الجزء الاول، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە: ١٠٠.

٢٣- مجلة بين النهرين، ژمارە (٢٢- ٢٣)، ساڵی (٦)، ١٩٧٨، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (اساقفة كركوك عبر التأريخ، روفائيل ميناس)، لاپەرە: ٢٧٦.

٢٤- شهداء المشرق، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە: ١٧٠.

٢٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢٦- تاريخ الكنيسة السريانية الشرقية، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە: ٤٧.

٢٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣٠- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٦٠.

٣١- بڕوانە: شهداء المشرق، هەمان سەرچاوەی پێشوو، مجلة بين النهرين، ژمارە (٢٧)، لاپەرە: ٧٩.

٣٢- تاريخ الكنيسة السريانية الشرقية، لاپەرە: ٨٣.

٣٣- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٣٨- ٨٤.

٣٤- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ١٠١- ١٠٢.

٣٥- بەکورتیو پوختی لەگەڵ بیروڕای سەرچاوەکان تێکهەڵکێش کراوە: اساقفة كركوك عبر التأريخ، روفائيل ميناس، مجلة بين النهرين، ژمارە (٢٢- ٢٣)، ١٩٧٨، لاپەرە: ٦.

٣٦- مجلة الاخاء، ژمارە (٢٢- ٢٣)، السنه، ١٩٨٢، ٢٢، لاپەرە: ١٢- ١٣، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (الفتوحات العربية للعراق و انهيار الدولة الساسانية، دور النصارى في هذة الفتوحات، (١٩)، روفائيل ميناس لاپەرە: ١٢- ١٣.

٣٧- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ١٦- ١٧.

٣٨- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ١٥٩.

٣٩- تأريخ الكنيسة السريانية الشرقية، الجزء الثاني، لاپەرە: ٧٨- ٧٩.

٤٠- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ١٤٩.

٤١- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ١١٨.

٤٢- مجلة الفكر المسيحي ١٩٥٧، السنة الثالثة عشر، لاپەرە: ٢٩٨.

٤٣- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٢٩٩.

٤٤- مجلة بيت النهرين، ژمارە (٥٣- ٥٤)، ١٩٨٦، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (اساقفة كركوك عبر التأريخ)، روفائيل ميناس، الجزء الثاني.

٤٥- تأريخ الوزارات العراقية، عبد الرزاق الحسني، الجزء الاول بغداد، ١٩٨٨، لاپەرە: ٢٠٦- ٢١١.
تأريخ الوزارات العراقية، عبد الرزاق الحسني، الجزء الثاني، بغداد، ١٩٨٨، لاپەرە: ٧٦- ٧٧.
٤٦- مجلة بين النهرين، (٥٣- ٥٤).
٤٧- تقويم الكنيسة المسيحية لسنة ١٩٩٧.
٤٨- ملامح في التأريخ القديم ليهود العراق، احمد سوسة، لاپەرە: ٨٧.
٤٩- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٩١.
٥٠- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٩٤- ٩٤.
٥١- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٩٥.
٥٢- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٩٧- ١٠٠.
٥٣- ئایین‌و باوەر لە کوردستاندا، کەریم زەند، هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٣٦٢.
٥٤- بروانە ئەم سەرچاوانە:
تقويم سنه (١٩٩٧).
مجلة الفكر المسيحي ژمارە (٢١٨- ٢١٩) هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٣١٩.
٥٥- مجلة الفكر المسيحي، ژمارە (٢١٨- ٢١٩) هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٣٦٢.
٥٦- مجلة الفكر المسيحي، هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٣٦٧.
٥٧- هەمان سەرچاوە.
٥٨- مجلة الفكر المسيحي، هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٣٧٠- ٣٧١.
٥٩- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٣٧٢- ٣٧٣.
٦٠- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٣٧٥.
٦١- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٣٨٣.
٦٢- شهداء المشرق، الجزءالاول، هەمان سەرچاوە، لاپەرەکانی: ٢٦٣- ٢٦٤- ٢٦٥.
٦٣- گۆڤاری پەیڤین، ژمارە (١٠)، ساڵی (٢٠٠٠)، لێکۆڵینەوەیەکی خۆمە بە ناونیشانی (مێژووی هونەری بیناسازی‌و نەخش‌و نیگاری ناوچەی کەرکوك)، سەردەمە ئیسلامییەکان، لاپەرە: ٤٥- ٤٦.
٦٤- مجلة الاخاء التركمانية، العدد١٠، ١٩٨٣، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (قصة الزمن فوق القلعة)، لاپەرە: ٦.
٦٥- هەمان سەرچاوە، لاپەرە: ٢٨.
٦٦- مجلة الفكر المسيحي، ژمارە، ساڵی ١٩٨٧، کانوونی یەکەم، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (كنيسة مريم العذراء في كركوك، الاب يعقوب شير) لاپەرە: ٤٢٠- ٤٢١.
٦٧- بروانە هەریەکە لەمانە: مجلة الفكر المسيحي، العدد ٢٣٠، کانون الاول، ١٩٨٦ السنة الثانيةوالعشرون، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (كنيسة الحمراء في كركوك، نوئيل بهجت) لاپەرە ٤١٢٩.
٦٨- سەرچاوەیەکی سریانییە، بروانە دەستنووسە بنەرەتییەکەی کە بە زمانی سریانییە، و سوپاسی برای بەڕێز (ئیستفیان رەبیان) دەکەم، کە بۆی وەرگێرامە سەر زمانی عەرەبی.
٦٩- مجلة بين النهرين، ژمارە (٥٣- ٥٤)، ١٩٨٦، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (اساقفة كركوك عبر التأريخ، روفائيل ميناس) لاپەرە: ١٢١- ١٢٢.
٧٠- مجلة فنون، ژمارە (٥٣- ٥٤)، ١٩٨٦، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (العاملون في المؤسسة العامة للاثار يدخلون قلعة من سبعة مواقع)لاپەرە: ٥٧- ٥٨.

## * کەرکوك لە سەرەتای فتوحاتی ئیسلامیدا

د. کەیوان ئازاد
مامۆستای زانکۆی سلێمانی

(کەرکوك) یان بە واتا مێژووییەکەی (کرخ سلوخ)[1] یان (باجرمی) تا دەرکەوتنی سووپای عەرەبی ئیسلامی سەر بە هەرێمی شارەزوور بوو، بەڵام دوای هاتنی ئەو سووپایە و گرتنی شارەکە بووە بەشێك لە هەرێمی جزیرە و شاری موسڵ و شارەکەش مەلبەندێکی کوردنشین بوو[2]. بەر لەوەشی شارەکە بکەوێتە دەست سووپای عەرەبی ئیسلامی شارێکی تەواو کوردنشین و چەندین پێکهاتەیەکی ئاینەکانی (زەردەشتی و مانی و مەسیحی) لێ نیشتەجێ بوون[3]. لەنێو زەردەشتی مانییەکان (بازرگان و پیشەوەر و کاسبکار)[4] و لەنێو مەسیحییەکانیشدا چەندین پزیشك و شارەزایی زانستەکانی (کیمیا، بیرکاری، ئەستێرەناسی) هەبوو[5]. دەرکەوتنی ئەوانیش بەهۆی ئەو خوێندنگایەکەوە بوو، کە مەسیحییەکان دروستیان کردبوو[6].

گەیشتنی سووپای عەرەبی ئیسلامی بەو شارە و بەستنەوەی بە دەوڵەتی خەلافەتی ڕاشدی بۆ ساڵی (٢١ك/٦٤٢ز) دەگەڕێتەوە، کاتێك خەلیفەی دووەمی ڕاشدی (عومەری کوڕی خەتاب) فەرمانی بە (عەیازی کوڕی غەنەم) کرد دەست بەسەر هەرێمی جزیرەدا بگرێت، (عەیان)یش (عوتبەی کوڕی فەرقەد)ی ڕاسپارد ئەرکی گرتنی ئەو شارە بەئەستۆ بگرێت[7]. سووپاکەی (عوتبە)ش دوای گرتنی شاری (تکریت) بەرەو ناوچەی کەرکوك بەڕێکەوت و ئەو شارەی گرت[8]. گرتنی شارەکەش بۆ ئەو فەرماندە ڕاشدییە ئاسان نەبوو، چونکە بەهۆی بوونی چەندین پێکهاتەی ئاینی لە شارەکەدا، سووپای عەرەبی ئیسلامی ڕووبەڕووی بەرەنگارییەکی توندی دانیشتووانی شارەکە بوویەوە. ئەنجامی ئەو بەرەنگارییەش کوژرانی ژمارەیەکی بەرچاو بوو لە هەردوولا[9]، بەڵام دواجار (عوتبە) توانی شارەکە بە زەبری هێز داگیر بکات. بەمەبەستی پاراستنی هێزەکەشی و مانەوەی لەو شارە، سەربازگەیەکی بۆ سووپاکەی لەناو قەڵای شارەکەدا دروستکرد[10]. دوای ئەوەش هەر لە ڕێ ئەو شارەشەوە (عوتبە) هێزێکی گەورەی بۆ بەهاناوە چوونی سووپاکەی (عەمری کوڕی عەزەی کوڕی قەیس) پێکهێنا، کە لە ڕووبەڕووبوونەوەی دانیشتووانی ناوچەی شارەزووردا دووچاری شکست هاتبوو[11]. ئەوە بوو دوای شەڕێکی قورس توانی دەست بەسەر بەشێکی ناوچەکەدا بگرێت. ئەو ڕووداوانەش کەوتنە ساڵی (٢١ك/٦٤١ز)[12].

دیارە لەم بوارەدا نابێت ئەوەش لەیاد بکەین، کە مێژوونووسانی عەرەبی و ئیسلامی لە ئاست تۆماری مێژووی ئەو شارەدا بەدرێژایی (سێ) ساڵی تەمەنی ئەو دەوڵەتە، کەمتەرخەمی زۆریان کردووە و شتێکی وەهایان تۆمار نەکردووە شایەنی باس بێت، بەڵام پێنا چێت بەدرێژایی تەمەنی ئەو دەوڵەتە، کەم بایەخ بووبێت، لانی کەم بەهۆی ئەوەی پێکەوەبەستی شاری (موسڵ و هەولێر) بوو بە شاری (کوفە)ی مەلبەندی ویلایەتی کوفە، کە سەرپەرشتی ناوچە دەست بەسەراگیراوەکانی دەوڵەتی دەکرد، بێ بایەخ نەبوو.

### * سەرچاوە و پەراوێزەکان:-

١- عباس قدياني: تأريخ اديان ومذاهب در ايران، چاپ اول، انتشارات انيس-تهران، ايران، ١٣٧٤هـ.ش، ص١٥٨.

٢- ابو القاسم عبيد الله بن احمد بن خرداذبة: المساك و الممالك، الطبعة الاولى، مطبعة بريل- ليدن، هولندا، ١٨٨٩م، ص٩٣.

٣- محمد اقبال لاهوري: سير فلسفه در ايران، ترجمه: ا.ج. اريان پور، چاپ اول، نشريه شماره (٨)، مؤسسه فرهنگى منطقه اى تهران، ايران، ١٣٤٩هـ.ش، ص٢٨، قدياني: تأريخ اديان، ص١٥٨، قدياني: تأريخ فرهنگ، صص(٢٨٨، ٢٩٨).

٤- لاهوري: س.پ، ل٢٨، حسين قاسم العزيز: البابكية او انتفاضة الشعب الأذربايجاني ضد الخلافة العباسية، الطبعة الأولى، دار الفارابي-مكتبة النهضة، بغداد، العراق، ١٩٧٩م، ص١١٥.

٥- سليمان الصائغ: تأريخ الموصل، الطبعة الاولى، القاهرة، مصر، ١٩٢٣م، ص١٩.

٦- مشيحازخا: كرونولوجيا اربيل، ترجمة و تعليق: عبدالعزيز الاحد نباتي، الطبعة الأولى، مطبعة وزارة التربية- اربيل، اقليم كردستان العراق، العراق، ٢٠٠١م، ص٧٥، ادي شير: تأريخ كلدو اشور، الطبعة الاولى، مطبعة الكاثوليكية للاباء اليسوعيين- بيروت، لبنان، ١٩١٣م، ٢٨٠/٢، هەروەها: Labour; Le Christainisme dans l Empire، Paris، France، 1950A.C، P289.

٧- احمد بن يحيى بن جابر البلاذري: فتوح البلدان، تحقيق: د. صلاح الدين المنجد، الطبعة الاولى، مطبعة دار النهضة المصرية- القاهرة، مصر، ١٩٥٧م، ص٣٠٨، ابي الفرج البغدادي قدامة بن جعفر: الخراج و صنعة الكتاب، تحقيق: د. محمد حسين الزبيدي، الطبعة الاولى، بغداد، العراق، ١٩٨١م، ص٣٨٢، عزالدين ابى الحسن علي بن محمد بن عبدالكريم الجزرى المعروف ب(ابن الاثير): الكامل في التأريخ، الطبعة الأولى، مطبعة دار الصادر- بيروت، لبنان، ١٩٦٥م، ٤١٦/٢.

٨- البلاذري: هـ.س، ٤١٠/٢، ابي الفرج البغدادي قدامة بن جعفر: الخراج و صنعة الكتاب، تحقيق: د. محمد حسين الزبيدي، الطبعة الاولى، بغداد، العراق، ١٩٨١م، ٣٨٢.

٩- البلاذري: س.پ، ص٣٠٨، ابن الاثير: س.پ، ٤١٦/٢، قدامة بن جعفر: س.پ، ص٣٨٢.

١٠- البلاذري: س.پ، ل٤١٠.

١١- محمد امين زكى: كورد و كوردستان، چاپى يەكەم، چاپخانەى دار السلام-بەغداد، عێراق، ١٩٣١م، ٩٢/١.

١٢- البلاذري: س.پ، ٢٥١/١.

*** کەرکوك و دەوروبەری لە سێبەری ئیسلام و خەلیفەکان:-**
**د. کەمال مەزهەر**

دوای ئەوەی کورد دەوڵەتەکەیان لەدەستدا، رۆڵی شارستانیان پاشەکشەی کرد، لە چوارچێوەی ئەو وڵاتانەی کە یەك لەدوای یەك حوکمی کوردستانیان کرد ئەوەش بەهۆی رووخانی میدییەکان، لەکاتێکدا ئەمە کارێکی سروشتی بوو کە پێشوازی لە ئیسلام بکەن، بەو پێیەی پێیان وابوو کە بەرەو دۆخێکی باشتر دەرۆن لەوەی کە تێیدا بوون، ئەوەش یەکەم بەرییەککەوتنی راستەوخۆ و فراوانی کورد و کوردستان بوو لەگەڵ عەرەب، لە کەرکوك و دەوروبەری، کە هەڵگری ئاڵای ئاینی نوێ بوون.

ئیسلام دەستی لە کیانی نەتەوەی نێو نیشتمانەکەیان نەدا، بەڵکو هاوکار بوو بۆ ئەوەی کیانەکەیان زیاتر بچەسپێت بەرووی گەلەکانی دیکە و رێکخراوە نائیسلامییەکان کە هاوسنووری کوردستان بوون، بە تایبەتی لەلایەنی باشوورەوە، توێژەرێکی بێ لایەن و دڵسۆزی ئیسلام دەڵێت، خەلیفەکان "هەرگیز هەوڵیان نەدا دەستووەربدەنە کیانی سەربەخۆی ئاغا و بەگە کوردەکان"(١)، مەبەستی لە ئەمیرە کوردەکانی ئەو سەردەمەیە، ئەمەش بێگومان یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکان کە هانی کوردی دا بۆ ئەوەی پێشوازی لە ئاینە نوێیەکە بکەن و دڵسۆز بن بۆی و قوربانی بۆ بدەن، پارێزگاریکردن لە تایبەتمەندییەکانی نەتەوەییەکانی کورد و زمانەکەیان لە سێبەری ئیسلامدا و شارستانییەتەکەیدا، هەرچەندە بوون بە خاڵێکی کارا بۆ هەردوو لایان، وانەیەکی باشیش بوو بۆ مێژوو دەبوایە رەچاو بکرایە، هەروەها گرنگیەکی تایبەتیشی هەیە کە کورد پێشوازیان لە عەرەب کرد، چونکە زمانی قورئانە و کەرەستەی رۆحە و نزیکبوونەوەیە لە خودا، بەڵام سنووری بەجێهێنانی فەریزەکانی تێنەپەڕاند، تەنیا بۆ پیاوە ئاینییەکان و پسپۆڕەکان کە هێشتا بەردەوام بوون بە دەستگرتن بە زمانی خۆیان و وەفایان بۆ نەتەوەکەیان، بۆیە جێی سەرسوورمان نییە کە زۆربەی شاعیرە دیارەکانی لە سەردەمی ناوەڕاست و نوێ لە هەمان کاتدا پیاوی ئاینی بوونە، هەندێکیشیان بە زمانەکەی خۆی بۆ ئاینییان نووسیوە، هەروەك کتێبەکان و میتۆدی ئاینی کوردی، بە کتێب و خوێندنگەکانی کەرکوکیشەوە زۆرجار بە هاوشانی زانستی ئاینی و رێوشوێنەکانی فیقە، بە ئەدەبی کورد فێردەکران.

کوردەکان بەردەوام بوون لە تێکەڵبوون بە رۆحی ئیسلام لە کەرکوك، مزگەوتەکانی شار و دەوروبەری و تەکییە و وەقف و خوێندنگە ئاینییەکانی بەدەستی پیاوانی کوردەوە بوو، کوردەکان لە خودی شاری کەرکوکدا شانازی بە نموونەکانیان دەکەن لەسەر بەرماڵی پێغەمبەر، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی چەندین خانەوادەی ئاینی کوردی ناسراو دروست ببێت بە ناوی خزمەتکاری بەرماڵ، کە پێگەی سیاسی و کۆمەڵایەتیان هەیە و لەپشتیانەوە چەندین ئەدیب و بیرمەند و کەسانی نەتەوەیی دەرچوون، چەندینی خەڵکی ئەو شارە بوون بە نوێنەر لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی، کە دواتر ئاماژەی بۆ دەکەین.

موسڵمانانی سەرەتا گرنگییان بە کەرکوك نەداوە، عەرەبە (البلدانیون) بەهیچ شێوەیەك بەم ناوەی ئێستای شارەکە باسی کەرکوکیان نەکرد، بە دەگمەنیش بە کرخینی(٢)، ناویان دەبرد "یاقوت و جوگرافیناسانی پێشوتریش باسیان نەکردووە"، وەکو ئەو دەقەی کە لە گۆڤاری (سومەر)ی عێراقی(٣)، باسی لێوەکردووە، سەبارەت بە کەرخینیش، ئەوە قلقشندی کە لە(١٤١٨ز کۆچی دوایی کردووە) وەکو شوێن و دانیشتووانیشی بە مۆرکی کورد شوێنەکەی دیاریکردووە، "مسالك الأبصار" بۆ جوگرافیناسی دیمەشقی ئیبن فەزڵ ئەڵلا ئەلعومەری کە لە ساڵی(١٣٤٨زاینی کۆچی دوایی کردووە)، لە نووسینەکانی کتێبی قلقشندیدا هاتووە:

"شاخەکانی کورد: وتی "رێرەوی چاو": مەبەست لێی شاخە، شاخەکان وەکو بەربەستێك بوون لەنێوان عەرەب و عەجەم، بەبێ ئەوەی کورد بچێتە نێو عەجەمەوە. وتیشی: سەرەتا لە چیاکانی هەمەدان و شارەزوور، تاکو کۆتایی صیاحی کفرە لە وڵاتی تەکفور، کە مەملەکەتی سیس کە بەدەستی ماڵی لاون خراوەتە سەری".

دوای ئەوە قلقشندی بیست شوێن دەژمێرێت و لە ژێربەندی دەیەمیندا دەڵێت:

"وڵاتی کەرخینی و دقوق الناقە . تایفەیەکیان هەیە (کوردن) ژمارەیان لە حەوتسەد کەس زیاترە و ئەمیرێکی تایبەتی خۆیان هەیە(٤)، جێی باسە حەوتسەد ژمارەیەکە بەپێی بینی دیمۆگرافی ئەو شوێن و سەردەمەیە.

داقوق (دقوقا) بەناوبانگترین شوێنی کەرکوك بوو لەو کاتەدا، بەڵکو کەرکوك تاکو کۆتایی سەدەی هەشت و کۆتایی چواردەی زایینی سەر بە داقوق بوو لە رووی ئیداری و ئابوورییەوە، هەروەك بەسترابوو بە هەولێر و شارەزوور و پەیوەندیی پتەوتر بوو بە بەراود لەگەڵ هەر ناوچەیەکی دیکەی لە هەموو روویەکەوە.

لەم روانگەیەوە جوگرافیناسە موسڵمانەکان (ئیبن خەردازبە لە سەدەی چواری کۆچی و یاقوت حەمەوی لەسەدەی حەوتی کۆچیی و ئەبو ئەلفیدا لە چارەکی کۆتایی لە سەدەی حەوت و سێ یەکی یەکەمی سەدەی هەشتی کۆچیی) کاتێك باسی داقوق دەکەن دەیبەستن بە هەولێرەوە(٥).

لە سەرەتای سەدەی هەشتی کۆچییەوە (چواردەی زایینی)، حەمەدەڵڵا ئەلمستەوفی ئەلقەزوینی جوگرافی و مێژووناس وەسفی جیهانی کردووە لە لاپەرەی ٢٤ لە کتێبە ناسراوەکە (نزهة القلوب) بەم شێوەیە وەسفی داقوقی کردووە:

"داقوق لە هەرێمی چوارەمدایە، شارۆچکەیەکی مامناوەندە ئاو و هەواکەی لە خۆشترین کەشی ئەیالاتەکانی عێراقی عەرەبییە".

لە بەرانبەردا لە سەردەمەکانی ئیسلامی یەکەم پەیوەندی بەغدا بە کەرکوك لاواز بوو، کەمجار رێی وشکانی نێوان بەغدا، کفری، داقوق، کەرکوك، هەولێر دەگیرایە بەر بۆ

گەیشتن بە موسڵ، بەڵکو پەیوەندییەکان لەنێوان موسڵ و بەغدا دەکرا، بەپێی وەسفی جوگرافیناسان هەمیشە لە کەنار رووباری دیجلەوە رێیان دەکرد[٦].

ئەم واقیعە رەنگدانەوەی بەهێزی هەبوو لەسەر دۆخی ئیداری و ئابووری کەرکوك و دەوروبەری، کاتێك ناوەکەی وابەستەی شارەزوور بوو هەر لە سەردەمی سەرەتاکانی ئیسلام ئەم سنوورەی بەزاند و هەولێر بووە بناغەی لەو کاتەدا کە تا ئەوێ رۆیشتووە لە کۆتایی عەباسییەکان، بۆ ئەوەی هەولێر ببێتە بناغەی لەو کاتەدا، لە ناوەراستی سەدەی حەوتی کۆچی (ناوەراستی سەدەی چواردەی زایینی) ئیبن خەلکان بەم شێوەیەی وەسفی شارەزووری کرد: "شارۆچکەیەکی گەورەیە و سەر بە کارگێری هەولێرە"[٧]، هەمان کار لە (تقويم البلدان) جێگیرکراوە لە ئەبی فیدا و سبح الاعشا قلقشندی و ئەوانی تریش، بەڵام یاقوت لەبارەی شارەزوورەوە، دەڵێت "خەڵکی ئەم ناحیانە هەمووی کوردن"[٨]، ئەو کوردانەش خاوەن سەربەخۆییەکی گەورەن، هەروەك بەم شێوەیەش گوزارشتی لێیان کرد "خەڵکەکەی یاخین لە دەسەڵات"[٩].

سەرچاوە ئیسلامییەکان جەخت لە بوونی ئەم شارە کۆنە دەکەن بە ناوی شارەزوورەوە کە دەکەوێتە کورە شارەزوور[١٠]، زۆربەی توێژەران لە رۆژهەڵاتناسەکانی ئینگلیزی کە پسپۆری جوگرافیا و مێژووی وڵاتانی ئیسلامین، گ. سترنگ (Le strange Guy) (١٨٥٤– ١٩٣٣)، شوێنی ئەو شارە بەیاسین تەپە نزیك لە شاری کەرکوکی ئێستا دەبەن[١١]. ئەو رۆژهەڵاتناسە خۆی راستییەکان دووپاتدەکاتەوە لەسەر کەرکوك و کورە شارەزوور و بە پشتبەستن بە ئیبن خەرزابە و قودامە و ئیبن حوقل و قەزوینی و مستەوفی:

"لەرێی چوار قۆناغ لە باکووری رۆژئاوای دینور شاری شارەزوور لە کورەی شارەزوورە، ئیبن حەوقەل ئاماژەی کردووە لە (سەدەی چوارەم – دەی زایینی) شارەزوور شارێکی شوورە رێژ کراوە و دانیشتووانەکەی کوردن، ناوی هۆزەکانی ئەو سەردەمەشی نووسیوە کە بریتی بوون لە (رغد العيش، كثرة رخص، خصب الناحية، بحالة واسعة و صورة رائعة).

ئیبن موهەلهەلیش لە سەدەی چوارەم (دەی زایینی) وەسفی کردووە و لە یاقووتەوە وەریگرتووە "شارەزوور چەند شار و گوندێکە، شارێکی گەورەی تێدایە، کە دەکات شارەکەی ئەمرۆ". کوردەکانی ئەم کورە کاتێك ئیبن موهەلهەل سەردانی کردووە نزیکەی شەست هەزار ماڵ بووە، کاتێك مستوفی لە سەدەی هەشت نووسێویتی، شارەزوور شارێکی گەورە بووە و خەڵکەکەشی کوردن"[١٢].

بەم ئەم قسانە و قسەکانی پێشوو دەردەکەوێت کە شارەزوور شارێکی مەزن بووە لەو کاتەدا، بەوەی ناوبانگی فراوانی ئابووری و سیاسی هەبووە و لە ناوچەیەکی فراوانیشدا ناسراوە و خەڵکێکی زۆریشی تێدا بووە.

بەپێی سەرچاوە کلاسیکییە عەرەبییەکان، ئیمارەتی ئەربیل ئەتابکییە "لە چوارچێوەی ئیمارەتی هەمەدانی و ئیمارەی القبجاقیە (القبجاقية) کە هاوسنووری هەولێر بوو و شارەزوور و ناوچەی کەرخینی – کەرکوکی لە خۆگرتبوو".

کەرکوك چووە سەر هەولێر لە سەردەمی ئەتابگییە بۆ ماوەی زیاتر لە سەدەیەك واتا (لە ٥٢٢ تاکو ٦٣٠ کۆچی، ١١٢٨– تاکو ١٢٣٣ی زایینی)، ئەو تەبەعیەتەی کە بەشێوەیەکی تایبەت لە سەردەمی موزەفەرەدین کوکبوری بەرجەستە بوو، کە حوکمی هەولێری دەکرد لە ساڵی ٥٨٦ تاکو ٦٣٠ کۆچی (١١٩٠ تاکو ١٢٣٢ زایینی)، تاکو کۆکبۆری داقوقی وەك بنکەیەك دیاری کرد بۆ ئەوەی رووبەرووی تەتەر ببێتەوە و رێگری لێیان کرد لەوەی بچنە نێو عێراقەوە[١٣]، بەڵکو گرتوخانەی قەڵای کەرکوکی کردە شوێنێك بۆ ئەوەی بارمتە یاخییەکانی تێدا دابنێت لە ماوەی ساڵانی حوکمەکەی[١٤]، م.ستریك (M. streck) لە بەرێوەبەرایەتی مەعارفی ئیسلامی، لەسەر ئەم بابەتە دەڵێت:

"ساڵ ٥٦٣کۆچی (١١٦٧ز) زینەددین عەلی کوچك کوری بەکتەکین دەوڵەتێکی دامەزراند و ئەربیلی کردە پایتەختەکەی، بەناوبانگترین سەرۆکەکانیشی لە خێزانی بەکتەکینییە کوردەکان بوو، وەکو موزەفەرەدین کوکبۆری کە زاوای سەلاحەدین بوو، ئەربلیش نەگەیشتە لووتکە بە درێژایی سەردەمەکانی ناوەراستی تاکو سەدەمی حوکمی ئەم ئەمیرە، موزەفەرەدین ئەم وڵاتەی زۆر فراوان کردەوە کە لە براکەی بۆی مابووەوە لە ساڵی ٥٨٦ کۆچی (١١٩٠ز) ئیمارەیەکی بچوکی هاوسنووری ملکەچ کرد و هەرێمی شارەزووریشی گرتە خۆی بە کەرکوکیشەوە"[١٥].

سەرچاوە تایبەتمەندەکان جەخت دەکەنەوە کە دانیشتووانی ئیمارەی ئەتابەگی و سوپای موزەفەرەدین کوکبوری سەرجەمیان کورد بوون[١٦]، بەڵکو ئەو سەرچاوانە دیاری دەکەن کە کەرکوك و دەوروبەری لەو سەردەمەدا سەر بە عەشیرەتەکانی زەنگەنە و جاف و هەمەوەندی کورد بوونە[١٧].

سنووری عێراق لە سەردەمی کۆتایی سەدەی چوارەوە تاکو ناوەراستی سەدەی شەشی کۆچی، لەباکووری سامەرا کۆتایی دێت[١٨]، لەشارە کوردییەکان تەنیا خانەقین و حەلوانی بە ئاراستەی باکووری رۆژهەڵاتی بەغدای لە خۆگرتبوو، بەڵام فراوانبوون بەرەو باکوور لەسەردەمی عەباسیەکانەوە دەستی پێکرد لە ساڵی ٥٥١کۆچی (١١٥٦) زایینی کاتێك هەوڵی شکستخواردوو دەدرا بۆ داگیرکردنی قەڵای تکریت کە دوای زیاتر لە سێ دەیە لەو بەروارە داگیرکرا، دواتر فراوانبوونەکە هەولێریشی گرتەوە "بەزۆر لەدوای کۆچی دوایی کوکبوری خاوەنی داگیرکرا لە ساڵی ٦٣٠کۆچی (١٢٣٢ز)، پێدەچێت شارەزووریش کە دەکەوێتە نێوان ئەربل و هەمەزان لە هەمان کاتدا خرابێتە سەر عێراق، چونکە سەر بە موزەفەرەدین کوکبوری بوو کە خاوەن ئەربل بووە" [١٩].

ئەمەش واتای ئەوەیە کە کوردستانی باشوور بە کەرکوك و دووربەرییەوە دوو ویلایەتی پێکهێنابوو لە دە ویلایەتەکەی عێراق، کاتێك سەردەمی عەباسی کۆتایی پێیان هێنا، ئەوانەش ویلایەتی ئەربیل و شارەزوور بوو، کە لە ساڵی ٦٣٠کۆچی (١٢٣٢ز) خرایە سەر عێراق.

لە ماوەی نزیکەی سەدەیەك لە کۆنترۆڵکردنی

مەغۆلییەکان لە عێراق هیچ دابەشبوونێکی ئیدارییان نەگۆڕی، وەکو سەردەمی عەباسی مایەوە، لەو سەردەمەدا بە ڕێکی ناوی کەرکوك هات بۆ یەکەمجار لە مێژوودا، ئەوەش لە مێژووی تەیمور لەنگ لە نووسینی شەرەفەدین عەلی یەزدی. کە ئەم کتێبە دەخوێنینەوە تەیمور دوای ئەوەی عێراقی داگیرکرد، ڕوویکردە دیار بەکر لە ڕێگەی داقوق و کەرکوك و ئاڵتون کۆپری (پردێ)، لەدوای مەغۆل حوکمی کەرکوك و دەورووبەری لەگەڵ هەرێمی شارەزوور گوازرایەوە بۆ (ئاق قۆینلو)؟[20].

لە قۆناغەکانی مێژوو کە هەرێمی شارەزوور بە کەرکوك و دەورووبەریشییەوە چووە چوارچێوەی ئیمارەتی کوردی نیمچە سەربەخۆوە، کە جاروبار دەردەکەوت، وەکو ئیمارە و حکومەتی حەسنەوەیە کە لە ناوەراستی سەدەی چواری کۆچی (ناوەراستی سەدەی دەی زایینی)، [21]دامەزرا، هەروەك ئیمارەی عەنازییەش لە کۆتایی هەمان سەدە دامەزرا[22]، کەرکوك و دەورووبەری پێگەیەکی تایبەتی هەبوو لەو ئیماراتانە، عەنازییەکان ئاڵوێری گەورەیان لەگەڵ سەلاجیقەکان هەبوو، وەکو لە ڕووداوەکانی ٤٩٥کۆچی (١١٠١ . ١١٠٢ز) دەستیان بەسەر هەموو وڵاتانی "سرخاب لە بەدر کوردی جگە لە داقوق و شارەزوور گرت". کە لەو چوارچێوەیەدا ئیمارەتەکانی تر دروستبوو و بووە بەشێك لە پشکی سرخاب ئیبن بەدر ئەلکوردی، کە خورماتوو و دەورووبەری دەگرتەوە، ئەوەش لە سەردەمی خەلیفە (ئەلموستەزهر بیلا ئەبو ئەلعەباس ئەحمەد"[23]، بەپێی "کامل"ی ئیبن ئەسیر و "شەرەفنامە"ی بەدلیسی و ئەوانی تر، داقوق لە سەدەکانی سێ و چوار و پێنجی کۆچی ناوەندی یەکێك لە سێ ئیمارە یەك لەدوای یەکەکانی حەسەنەوەی و عەیاری (عەنازی) و جاوانییە[24].

کەرکوك و دەورووبەری وەکو هەولێر بەردەوام دەچووە ئاقاری ئەردەڵانییەکان کە دواتر ئیمارەتەکەیان لە سەدەی پێنجی کۆچیی – دوانزەی زایینی دەرکەوت، سنوورەکەی تاکو زێی گەورە درێژەی دەکێشا، هەروەك ئیمارەتێکی بەهێزو ڕێکخراو بووە و تەنانەت جەنگیز خانیش دانی پێدا ناوە و جەلائرییەکانیش کە حوکمی عێراقیان دەکرد، نەیانتوانی بیگرنە خۆیان لە سەدەی چواردەی زایینی، لۆنگریگ دەڵێت:– ئەردەڵان یەکێك بووە لە باشترین ئەو ئیماراتانەی کە لە ناوچەکە دەرکەوت لە ڕووی شارستانییەت و حوکمی پادشایەتی بەر لە داگیرکردنی عوسمانییەکان بۆ عێراق، تەنانەت چەندین جاریش بە ئیمبراتۆریەت ناوبراوە[25].

* **سەرچاوە و پەراوێزەکان:-**

١- المقدم الشيخ عبدالوحيد، الأكراد وبلادهم، تأريخ الشعب الكردي منذ اقدم العصور حتى العصر الحاضر ص ٥٨ . ٥٩.

٢- "سومر" المجلد الثامن الجزء الاول ١٩٥٢، ص ٢٧٥.

٣- "سومر" المجلد الثاني عشر، الجزء الاول و الثاني ١٩٥٦ ص ٤٣

٤- القلقشندي، شهاب الدين احمد، صبحي الاعشى، الجزء الرابع، ص ٣٧٣، ٣٧٤.

٥- "مجلة المجمع العلمي العراقي" (الهيئة الكردية"، بغداد المجلد العاشر، ١٩٨٣، ص ٢٧٢ . ٣٧٣، "سومر"، المجلد الثاني عشر، الجزء الاول و الثاني ١٩٥٦، ص ٤٤

٦- the encyclopedia of islam" vol. II. 1027

٧- ابن خلكان، وفيات الاعيان و ابناء ابناء الزمان، حققه و علق حواشيه و وضع فهارسه محمد محي الدين عبدالحميد، الجزء الثالث، القاهرة، ١٩٤٨، ص ٢٢٣: عبدالسلام محمد هارون، معجم مقيدات ابن خلكان القاهرة ١٩٨٧، ص ١٩٣

٨- ياقوت الحموي، معجم البلدان، باشراف فردناند و ستنفلد، المجلد الثالث، لايبرزغ، ١٨٦٨، ص ٣٤٠.

٩- كورة: مصطلح اداري استخدم في العهد الاسلامي و الكورة في مختار الصحاح للرازي ص ٥٨٢ "المدينة و الصقع، و الجمع كور" و في المنجد" ص ٧٠٢" البقعة التي تجتمع فيها مساكن و القرى.

١٠ – كي لسترنج، بلدان الخلافة الشرقية، يتناول صفة العراق و الجزيرة و ايران و اقاليم اسيا الوسطى، منذ الفتح الاسلامي حتى ايام تيمور، نقله الى العربية بشير فرانسيس و كوركيس عواد، من مبوعات المجمع العلمي العراقي بغداد، ١٩٥٤ ص ٢٢٥.

١١- المصدر نفسه، ص ٢٢٥ . ٢٢٦

١٢- عند ذلك ينظر: محسن محمد حسين، اربيل في العهد الاتابكي ٥٢٢ . ٦٣٠هـ– ١١٢٨ . ١٢٣٣م، بغداد، ١٩٧٦ ص ١٧٩

١٣- سومر، المجلد الثاني عشر، جزء الاول و الثاني، ١٩٥٦، ص ٤٨.

١٤- محسن محمد حسين المصدر السابق، ص، ٢٠٩، ص ٤٨.

١٥- دائرة معارف الاسلامية، الطبعة العربية، المجلد الاول، العدد الاول، اكتوبر ١٩٣٣، ص ٥٧١

١٦- عبدالقادر احمد طليمات، مظفر الدين كوكبوري امير اربل، القاهرة، ١٩٦٣، ص ١٩٥ . ١٩٦.

١٧- فهمي عرب و فاضل محمد، مدينة كركوك، ترجمة هةتاو، مجلة هةتاو، العدد ١٢٨، ١٠ نيسان ١٩٥٨، ص ٣

١٨- في العصر البويهي (٩٤٥ . ١٠٥٨) كان يحدد اقليم كرديستان من شمال خط يمر عبر انبار على نهر الفرات الى تكريت على نهر دجلة (ينظر: محمد حسين الزبيدي، العراق في العصر البويهي، التنظيمات السياسية و الادارية و الإقتصادية، القاهرة، ١٩٦٩، ص ٦٥.

١٩- للتفصيل عن ذلك ينظر: الدكتؤر بدري محمد فهد، تأريخ العراق في العصر العباسي الاخير، (٥٢٢ . ٦٥٦هـ-١١٥٧ . ١٢٥٨)، بغداد ١٩٧٣، ص ٤-٧.

٢٠- عن ذلك وعن تقسيم الاداري للعراق في العصر العباسي الاخير ينظر: المصدر نفسه: ص ١٢٨ . ١٤١

٢١- الدكتور محمد صالح داود القزاز: الحياة السياسية في العراق في عهد السيطرة المغولية، النجف، ١٩٧٠، ص ٢١٩.

٢٢- j. h. Kramer، op. cit.، p. 1027

٢٣- علي اكبر دهخدا، لغتنامة، شمارة مسلسل، ١٧١، شمارة حرف شين، ثخش دوم، تهران، خرداد ١٣٥٠هـ . شمسي: محمد امين زكي، خلاصة تأريخ الكرد و كردستان من اقدم العصور التأريخية حتى الان، نقله الى العربية و علق عليه محمد علي عوني، القاهرة، ١٩٣٩، ص ١٤٠ . ١٤١.

٢٤- encyclopedia Iranica"، vol، II، London، 1985، pp. 97-98 مجلة المجمع العلمي العراقي الهيئة الردية، المجلد العاشر، ١٩٨٣، ص ٣٨٦.

٢٥ - للتفصيل عن ذلك تنظر: سومر، المجلد الثاني عشر، الجزء الاول، و الثاني ١٩٥٦، ص ٤٦ . ٤٧.

٢٦- عن ذلك تنظر: مجلة المجمع العلمي العراقي، المجلد العاشر، ١٩٨٣، ٤٣٤.

٢٧- s. h. longrigg، four centuries of modern Iraq، oxford، 1925، pp، 5-6 (في الترجمة العربية لجعفر خياط، بغداد، الطبعة الخامسة، ص ١٨)

*** بارودۆخی سیاسی داقوق پێش هاتنی ئیسلام:**

**ئاریان جەمال هەرزانی**

پێگەو شوێنی کورەی باجرمێ (کە داقوق بەشێك بوو لەم کورەیە) لە ڕووی ستراتیژییەوە کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر ژیانی دانیشتووانی، بەهۆی هاوتخوبی لەگەڵ هەرێمی جەزیرە کە هەمیشە مەیدانیك بوو بۆ زۆربەی ئەو جەنگانەی کە لەنێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیو ساسانی ڕوویدەدا. بەهۆی گرنگی شوێنی ئەم هەرێمە کە دەکەوێتە سەر ڕێگای بازرگانیو گواستنەوەو پەڕینەوەی سەربازانی هەردوولا[1]، ئەم کارە زیانێکی زۆری بە ناوچەکە گەیاند لە ڕووی مرۆییو ئابووریدا.

ئاسەواری ئەم ململانێیە کاردانەوەی لەسەر ژیانی دانیشتووانی داقوق ڕەنگی دایەوە کاتێك چەوسانەوەی ئایینی لەسەر دەستی دەسەڵاتدارانو پیاوانی دەوڵەتی ساسانی دژی ئەوانەی کە باوەڕیان بە ئاینی مەسیحییەت هێنابوو لەبەر چەندین هۆکار[2]، بەتایبەتی دوای باوەڕهێنانی قوستەنتینی گەورە[3] بە مەسیحییەت[4]. پێدەچێت چەوساندنەوەی مەسیحییەکانی ناوچەکە لەلایەن ساسانییەکانەوە هۆکارێك بووە بۆ ئاسانکردنی پرۆسەی ئازادکردنی ناوچەکە لەلایەن موسڵمانەکانەوە، سەرچاوە مەسیحییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە مەسیحییەکان پێشوازیان لە موسڵمانەکان کرد کاتێ کە چوونە ناو عێراقو سەبازەکانیان لە کڵێسەکان دابەزان[5].

*** داقوق لە سەردەمی ڕاشدیدا:**

**أ. ماوەی ئازادکردنی:**

دوای سەرکەوتنی موسڵمانەکان لە جەنگی جەلەولا لە ساڵی (١٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (٦٣٨)ی زاینیی[6]، لەشکری موسڵمانەکان دابەشکرایە سەر میحوەرێکی سەرەکیو چەند میحوەرێکی لاوەکیو یەکێك لەو میحوەرە لاوەکیانە میحوەری (جەلەولا – ڕازانات[7] – داقوق – خانیجار – سن بارما) بوو.

(بوازیج ئەلمەلیك) تاکو شارەزور[8]. (سەعد کوڕی ئەبی وەقاس) هێزێکی بە سەرکردایەتی (هاشم کوڕی عوتبە کوڕی ئەبی وەقاس)و (ئەشعەس کوڕی قەیس) نارد[9]، لە بە (ڕازانات) تێپەڕینو گەیشتنە داقوقو خانیجارو دەستیان بەسەر ئەو ناوچانە گرتو هەموو کورەی باجرمێیان ئازاد کرد[10]. پێدەچێت ئازاد کردنی داقوق لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٦)ی کۆچی بەرامبەر (٦٣٨)ی زاینیی بێت، هەروەها پێدەچێت بە ڕێکەوتن ئازاد کرا بێت چونکە بە پێی ئەو دەقەی کە لە کتێبەکەی (بەلازری) هاتووە وادیارە لەشکری موسڵمانەکان تووشی هیچ بەرەنگارییەك نەهاتووە لە ئازاد کردنی کورەی باجرمێ، ئەوەی جەخت لەم بۆچوونە دەکا پاشای ساسانییەکان (یەزدەگردی سێیەم) (٦٣٢ – ٦٥١) ی زاینیی، هەستا بە کۆکردنەوەی سوپای ساسانییەکان لە جەلەولا[10]، ڕووخانی بنکەیەکی گرنگی وەك قەڵای تکریت لە مانگی جمادی ساڵی (١٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (٦٣٨) ی زاینیی[11].

هەندێ توێژەر ئاماژە بەوە دەکەن کە ئازاد کردنی کورەی باجرمێ لەسەر دەستی (عوتبە کوڕی فەرقەد ئەلسەلما) بووە[12]، ئەوەش بە پێی ئەو دەقەی لای (بەلازری) هاتووە: (وفتح عتبة بن فرقد الطيرهان[13]وتكريت وأمن اهل حصن تكريت على انفسهم وأموالهم وسار في كورة باجرمي ثم صار الى شهرزور)[14]. ئەوەی لەم دەقە بۆمان دەردەکەوێت (عوتبە کوڕی فەرقەد) تەنها بە کورەی باجرمێ تێپەڕیوە بۆ شارەزوورو هیچ ئاماژەیەکی بە ئازاد کردنی کورەی باجرمێ تێدا نییە، هەروەها کورەی باجرمێ لە ساڵی (١٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (٦٣٨)ی زاینیی ئازاد کرا، بەڵام تێپەڕبوونی (عوتبە) لە باجرمێ بۆ شارەزوور ساڵی (٢٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (٦٤١)ی زاینیی بووە[15].

**ب. بەڕێوەبردنی:**

داقوق لە سەردەمی ڕاشدیدا لە ڕووی کارگێڕییەوە سەر بە (کوفە) بوو، وەك لە سەرچاوەکاندا هاتووە کاتێك پیاوێکی موسڵمان لە داقوق دەمرێ تەنها دوو پیاوی مەسیحی شاهیدی وەسیەتنامەکەی دەبن، هەردووکیان چوون بۆ کوفە، لەوێ (ئەبو موسا ئەلئەشعەری) کە والی کوفە بوو لە دوای نوێژی عەسر هەردووکیانی سوێندا بە ڕاستو ڕەوایی وەسێتنامەکەو شاهیدیان قبوڵکرا[16]. بە ڕۆیشتنی ئەم دوو شاهیدە لە داقوقەوە بۆ کوفە بۆمان دەردەکەوی کە داقوق سەر بە کوفە بووە. زانیارییەکان لە بارەی داقوق لە سەردەمی ڕاشدی زۆر کەمو دەگمەننو پێدەچێت ئەمەش بۆ دوو هۆکار بگەڕێتەوە:

١. دەگمەنی ڕوودانی کردەوەی سەربازیو سیاسی لە ناوچەکەدا کە مێژوونووسە موسڵمانەکان پێشینەکان بایەخیان پێدەدا بۆ تۆمارکردن، هەروها کەمی شارو شارۆچکە گەورەکان لە ناوچەکەو کەمی ڕێژەی دانیشتووانی[17].

٢. زۆربەی دانیشتووانی داقوقو دەورووبەری لە (ئەهل ئەلزیمە) پێکهاتبوو[18]. بە هۆی ئەوەشەوە موسڵمانان دەستیان لە کاروباریان تێوەرنەداوە.

*** داقوق لە سەردەمی ئومەویدا:**

**أ. لایەنی کارگێڕیو بەڕێوەبەری:**

لە دەستپێکی فەرمانڕەوایی ئومەوی داقوق سەر بە کوفە بوو پاشان خرایە سەر موسڵ، دەربارەی ئەو ماوەیەی کە داقوق خرایە سەر موسڵ لە سەرچاوە مێژووییەکاندا دوو ڕای جیاواز هەیە. لای (بەلازری) هاتووە (مەتەر کوڕی عیمران) لە باجرمێ یا لە داقوق کوژرا لە موسڵ[19]، شۆرشی (مەتەر کوڕی عیمران) پێش شۆڕشی (ساڵح کوڕی مەسرەح)[20] بوو واتا پێش ساڵی (٧٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (٦٩٥) ی زاینیی. بەڵام لای (ئەزدی) دەڵێت: (داقوق سەر بە کوفە مایەوە تا ساڵی (١١٣)ی کۆچی بەرامبەر بە (٧٣١)ی زاینیی، لەم ساڵەدا سنووری ویلایەتەکان ڕێکخراو داقوق بوو بە بەشێك لە موسڵ[21].

**ب. داقوق و بزوتنەوەی خەوارج (شوراتەکان):**

(خەوارج – شوراتەکان) کۆمەڵەیەکی ئایینی سیاسین قایل نەبوون بە ناوبژیوانی و دادوەری لەو ململانێیەی نێوان خەلیفە (عەلی کوڕ ئەبی تالیب) و (موعاویە کوڕی ئەبی سوفیان) لە شەڕی (سەفین) لە ساڵی (٣٧)ی کۆچی بەرامبەر بە (٦٥٧)ی زایینیی و بیروباوەڕیان (ان الحکم الا لله) و پێشەوایی بۆ هەموو موسڵمانێکە، پەیوەست نییە بە چینێك یا کۆمەڵە کەسێکی تایبەت بەڵکو کۆشش و کۆ دەنگی خەڵکی شورایە[22]. بۆیە هەندێ کەس وا دەبینن کە خەوارجەکان نوێنەرایەتی دیموکراسی ئیسلامی دەکەن چونکە وایان دەبینی کە پلەی (خەلیفە) ماف هەموو موسڵمانێکە بێ جیاوازی نێوان قورەیشی و غەیرە قورەیشی[23].

لە سەردەمی ئومەوی چەندین شەڕ لەگەڵ خەوارجەکان لە داقوق ڕوویدا. (یاقوتی حەمەوی) ئاماژە بەوە دەکات کە شەڕێك لە داقوق ڕوویداو ژمارەیەك لە خەوارجەکان لەو شەڕەدا کوژران و (جەعدی کوڕی ئەبی زەمان ئەلدەوسی) شیعرێکی لاوانەوەی بەسەریان نووسی:

شباب اطاعوا الله حتى احبهم وكلهـــم شار يخاف ويطمع
فلما تبوؤا من دقوقا بمنزل لميعاد اخوان تداعوا فاجمعوا
دعوا خصمهم بالمحكمات وبينوا ضلالتهم والله ذو العرش يسمع
بنفسي قتلى في دقوقاء غودرت وقد قطعت منها رؤوس واذرع
لتبك نساء المسلمين عليهم في دون مالاقين مبكى ومجزع[24].

لەم دێڕە شیعرانە وادیارە داقوق ناوەندێکی گرنگ بووە لای خەوارجەکان، شەڕێکی سەخت لێی ڕوویداوە بە شکست و کوشتارێکی زۆری خەوارجەکان کۆتایی بەم شەڕە هاتوە.

لە بزوتنەوەکانی خەوارج کە داقوق و دەوروبەریان کردبوو بە بنکەی خۆیان بزوتنەوەی (مەتەر کوڕی عیمران کوڕی شوور) بوو، (بەلازری) دەڵێت: (دەرچوونی مەتەر پێش دەرچوونی سالح کوڕی مەسرەح بوو، بە دەستی سوارەکانی محەمەد کوڕی مەروان[25] کوژرا لە دەوروبەری باجرمێ یا داقوق لە خاکی موسڵ)[26].

هەروەها بزوتنەوەی (شەبیب ئەلخارجی) کە بە نازناوی (ئەبی ئەلسەحارا)[27] و (ئەلحەروری)[28] ناسرابووو بزوتنەوەی (شەبیب) درێژەپێدراوی بزوتنەوەی (سالح کوڕی مەسرەح) بوو کە لە مانگی (جەمادی ئاخیرە)ی ساڵی (٧٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (٦٩٥)ی زایینیی کوژرا[29]. لە ڕووداوەکانی ئەو ساڵە هاتووە: (شەبیب خەڵکی بادیەی تۆقاند بوو دواتر دەستی گرت بەسەر (قەتقەتانە)[30] دواتر (قەسر موقاتل)[31] دواتریش (کەناری فورات) تا گەیشتە (ئەلحەساسە)[32] دەستی بەسەرداگرت دواتر تا (ئەنبار) و چووە ناو داقوق و دواتر هەڵکشا بەرەو خوارووی ئەزربێجان)[33]. دووبارە (شەبیب) بەرەو ڕەشەخاك گەڕایەوە، لە سەرچاوەکاندا هاتووە (شەبیب) گەیشتە (خانیجار – خورماتوو) و خۆی ئامادەکرد بەمەبەستی ڕۆیشتن بەرەو (کوفە)[34]. وا مەزەندە دەکرێت (شەبیب) بە داقوق تێپەڕیبێت لە کاتی ڕۆیشتنی بۆ (خانیجار) بە هۆی نزیکی ماوە لەنێوانیاندا[35]. (حەجاج کوڕی یوسف) چەندین لەشکری ناردە سەر (شەبیب) بەڵام سەرکەوتن بۆ (شەبیب) بوو[36]، ئەمش بووە هۆی ئەوەی (حەجاج) بانگێشی (عەبدولرەحمان کوڕی ئەلئەشعەس) بکاو فەرمانی پێدا (٦٠٠٠) سوار لەناو خەڵکی هەڵبژێرێت و ناردی بۆ بەرنگاربوونەوەی (شەبیب) و ئەویش فەرمانەکەی بەجێهێنا، هەر کاتێك (عەبدولرحمان) نزیکدەبوو لە (شەبیب)، (شەبیب) پاشەکشەی دەکرد لەبەرامبەری تا گەیشتە داقوق و شارەزوور و لەوێشەوە هەڵکشا بەرەو سنوور[37].

ئەگەر سەرنج بدەین لەم دەقانە چەند شتێکمان بۆ دەردەکەوێ:

١. داقوق یەکێك بووە لە ناوەندە گرنگەکانی خەوارجەکان بە هۆی پێگەی جوگرافی ئەم شارە کە کەوتبووە نێوان ڕەشەخاك و هەرێمی چیا و شارەزوور کە مەڵبەندو ناوەندێکی گرنگی خەوارجەکان بوو بە هۆی سەختی ناوچەکەو دووری پایتەخت و ناوەندی خیەلافەت[38].

٢. ئاسانی جوڵانەوەی خەوارجەکان لە داقوق و دەوروبەری بەڵگەیە کە تا چەند دانیشتووانی ناوچەکە هاوکاری خەوارجەکان بوون و ئەمە بۆتە هۆکاری بەردەوام بوونی بزوتنەوەکەیان. هۆکاری ئەم هاوکارییە دەگەڕێتەوە بۆ:

أ. خراپی سیاسەت و هەڵسوکەوتی دەوڵەتی ئومەوی بەرامبەر بە مەوالییەکان کە زۆرینەی دانیشتووانی ناوچەکە بوون، هەروەها پەیڕەوکردنی سیاسەتی دەمارگیری نەتەوایەتی[39]. ئەمانە بوونە هۆکارێك و پاڵنەرێك بۆ هاوکاریکردنی بزوتنەوەکانی خەوارجەکان، (ئیبن خلدون) دەڵێ: (ئەم کارە لە دەوڵەتی بەنی ئومەیە دەرکەوت کە چۆن لە شەڕەکانیان و دانانی میرەکانیان پشت ئەستور بوون بە عەرەب)[40]. پەیڕەوکردنی ئەم سیاسەتە بەهێزتر بوو کاتێ کە (حەجاج) بوو بە والی عێراق، (حەجاج) دەربارەی مەوالی دەڵێ: (انما الموالی علوج العجم)[41].

ب. ڕۆڵی مەسیحییەکان لە بزوتنەوەی خەوارجەکان، دەوترێ (شەبیب) ڕێکەوتنێکی هەبوو لەگەڵ مەسیحییەکانی ناوچەکە، هەر چەند مەسیحییەکان ئاشکرا پشتگیریان نەکرد بەڵام ئەوەنە هاوکارییان کردووە کە لە توانایان هەبوو[42]. (برۆکلمان) دەڵێ: (مەسیحییەکانی ناوچەکە هاوکاری و یارمەتیان دەدا)[43]. لەبەر ئەوەی مەسیحییەکان ڕێژەیەکی کەم نەبوون لە ناوچەکە[44]، پێدەچێت ڕۆڵیان هەبێ لە پێشکەش کردنی یارمەتی و هاوکاری بۆ بزوتنەوی خەوارجەکان.

*** داقوق لە سەردەمی عەباسی لەنێوان ساڵانی (١٣٢ - ٣٢٤)ی کۆچی بەرامبەر بە (٧٤٩ - ٩٣٦)ی زایینی:**

لە سەرچاوەکاندا هیچ ئاماژیەك نییە دەربارەی هەڵوێستی دانیشتووانی داقوق بەرامبەر بە شۆڕشی عەباسییەکان و دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان، یەکەمین ئاماژە لەسەر داقوق لە سەردەمی عەباسییەکان لە ڕووداوەکانی ساڵی (١٩٩)ی کۆچی بەرامبەر بە (٨١٤)ی زایینی دەرکەوتووە، لە سەردەمی خەلیفەی (مەئمون)ی عەباسی (١٩٨ - ٢١٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (٨١٣ - ٨٣٢)ی زایینی (ئەبو ئەلسەرایا ئەلسری)[٤٥] یاخی بوو لە دەوڵەتی عەباسی، (ئەبو سەرایا) یەکێك بوو لە پیاوەکانی (هرسمة کوری ئەعیون)[٤٦] و هۆی یاخیبوونی ئەوە بوو کاتێك (هرسمە) مووچەی (ئەبو سەرایا) و سەربازەکانی بری، (ئەبو سەرایا) هەڵیکوتایە سەر چەند شارێك و پارەو پوڵی لە میرەکانی بردو دابەشی کردە سەر هاوەڵ و سەربازەکانی و ئەو هاوەڵ و سەربازانەی کە مابوون ئەمیان بیست ڕوویان لە (ئەبو سەرایا) کردو ژمارەیان زیادی کرد. پاشان بە (٧٠٠) سوارەوە بەرەو داقوق بەڕێکەوت و کاتێ (ئەبو زرغام ئەلعجێلی) میری داقوق ئەمەی بیست لە دەرەوەی داقوق بە یەك گەیشتن و لە ئەنجامی پێکدادان لەنێوانیان (ئەبو زرغام) هەڵات و لە کۆشکی داقوق خۆی قایمکرد، (ئەبو سەرایا)ش گەمارۆی کۆشکەکەیدا پاشان لە کۆشکەکە دەریهێنا دوای ئەوەی پەیمانی پێدا بەسەلامەتی دەربچێ و هەموو پارەو پوڵی برد[٤٧].

لە ساڵی (٣٠٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٣١)ی زایینی و لە سەردەمی خەلیفە (ئەلموقتدر باللە)ی عەباسی (٢٩٥ - ٣٢٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٠٨ - ٩٣٢)ی زایینی داقوق درایە دەست (بەدر ئەلشەرابی)[٤٨]، لای (سابی) هاتووە: (پلە ناوەندییەکان[٤٩] درانە بەدر بۆ پاراستنی ڕێگای خوراسان و ئەنبار[٥٠] و ڕازانات و داقوقا و خانیجار، ئەویش کردیانی بەسەربازو ژمارەی ڕۆژی مانگەکانی کرد بە سەدو بیست ڕۆژ)[٥١]، هەروەها لای (ئیبن ئەلئەسیر) هاتووە: (بەدر ئەلشەرابی دەسەڵاتی وەرگرت لە داقوق و عەکبەرا[٥٢] و ڕێگای موسل)[٥٣]، لەم دوو دەقە مێژووییە بۆمان دەردەکەوێ ئەو ناوچانەی کە خراونەتە ژێر دەسەڵاتی (بەدر ئەلشەرابی) بریتی بووە لە ناوچەیەکی فراوان و گرنگ لە ڕووی رامیاری و ئابوورییەوە.

لە ساڵی (٣١٧)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٢٩)ی زایینی (تەحریر ئەلسەغیر)[٥٤] فەرمانی ڕەوایەتی هەرێمی موسلی پێی ڕاسپێردرا و بەرەو موسل بەڕێکەوت و هەر لە هەمان ساڵدا لەوێ کۆچی کرد، لە ساڵی (٣١٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٣٠)ی زایینی (ناسر ئەلدەولە ئەبو ئەلهەیجا عەبدوڵلا کوری حەمدان) کرا بە والی و لە هەمان ساڵیشدا دوورخرایەوە، دواتر هەردوو مامی (سەعید) و (نەسر) کران بە والی[٥٥]. لە ساڵی (٣٢٤)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٣٦)ی زاینی خەلیفە (ئەلرازی باللە)ی عەباسی (٣٢٢ - ٣٢٩)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٣٤ - ٩٤٠)ی زایینی (ناسر ئەلدەولە ئەلحەمدانی)ی کرد بە میری و دەسەڵاتی لە تکریتەوە تا ئامەدی پێ بەخشی[٥٦].

لە هەمان ساڵدا خیلافەت چووە ناو قۆناغێکی نوێوەو ناسرا بە قۆناغی (میری میران - امرة الامراء) کە لە ساڵی (٣٢٤)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٣٦)ی زایینی تاکو (٣٣٤)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٤٦)ی زایینی خایاند، دەسەڵاتی ڕاستەقینە کەوتە دەست میری میران، بەوڵەتی ئیسلامیش دابەشبوو بۆ چەندین دەوڵەتی بچووك و چەندین میرنشین، دەسەڵاتی خەلیفە تەنها لەو ناوچانەی نێوان بەغداو واست مابوو[٥٧].

*** داقوق و بزوتنەوەی قەرمەتییەکان:**

قەرمەتییەکان بەشێکی توندڕەون لە شیعەی ئیسماعیلی، لە کوفە لە عێراق دروست بوون و دیگەڕێنەوە بۆ حەمدانی کوری، توانییان دەوڵەت لە (بەحرێن) و (شام) دابمەزرێنن و لە ساڵی (٣١٧)ی کۆچی پەلاماری (مەکە) یانداو بەردە ڕەشیان هەڵکەندو بردیان بۆ بەحرێن، دوای بردرا بۆ کوفەو لەوێشەوە گەڕێندرایەوە بۆ (مەکە)[٥٨].

لە ساڵی (٢٩٣)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٠٦)ی زایینی و لە سەردەمی خەلیفە (ئەلموکتەفی باللە) (٢٨٩ - ٢٩٥)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٠٢ - ٩٠٨)ی زایینی هێزەکانی داقوق بەشدارییان کرد لە بەرەنگاربوونەوەی قەرمەتییەکان، دوای ئەوەی قەرمەتییەکان لە (کوفە)وە هەڵاتن بەرەو (قادسیە) (ئیسحاق کوری عیمران) نووسراوێکی نارد بۆ خەلیفەی سوڵتان داوای یارمەتی لێکرد، خەلیفەش کۆمەڵێ سەرکردەی گەورەی بۆ نارد[٥٩] و ڕۆیشتن تا گەیشتنە (سەوان) نزیك (قادسیە)، (قاسمی کوری سیما) فەرمانی سەرۆکی خێڵە عەرەبەکانی کرد بە کۆکردنەوەی چیاوانی خێڵە عەرەبەکانی لە (دیار موزر) و ڕێگای فورات و دقوقا و خانیجارو چەندین ناوچەی تر بۆ بەرنگاربوونەوەی ئەو قەرمەتیانە[٦٠].

*** داقوق و میرنشینی حەمدانی:**

حەمدانییەکان بە ڕەچەڵەك ئەگەڕێنەوە بۆ (حەمدان کوری حەمدون) کە بەشێکن لە خێڵەکانی (تەغلوب کوری وائیل) کە لە عەرەبە عەدنانییەکانن[٦١]. (حەمدان) ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە لە ڕووداوە سیاسییەکانی موسل، هەشت کوری هەبوو بەناوبانگترینیان (ئەبی ئەلهەیجا عەبدوڵلا) کە باوکی هەر یەك لە (حەسەن) کە نازناوی (ناسر ئەلدەولە) بوو (٣١٧ - ٣٥٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٢٩ - ٩٦٧)ی زایینی کە دامەزرێنەری دەوڵەتی حەمدانیە لە موسل، (عەلی) کە نازناوی (سەیف ئەلدەولە) بوو (٣٣٣ - ٣٥٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٢٩ - ٩٦٧)ی زایینی دامەزرێنەری دەوڵەتی حەمدانییە لە حەلەب، لە دوای مردنی (ناسر ئەلدەولە) کورەکانی یەك لە دوای یەك حوکمرانی میرنشینەکەیان کردو بە کوشتنی میر (ئەبو تاهیر ئیبراهیم) لەسەر دەستی (ئەبی ئەلزوئاد محەمەد کوری ئەلموسەیەب) لە ساڵی (٣٨٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٩١)ی زایینی کۆتایی بە میرنشینەکەیان هات[٦٢].

دەربارەی پەیوەندی دەوڵەتی حەمدانی بە داقوق لە ساڵی (٢٩٣)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٠٥)ی زایینی بە پێی

فەرمانی خەلیفە (موکتەفی باللە)ی عەباسی (٢٨٩ - ٢٩٥)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٠٢ - ٩٠٨)ی زایینیی (ئەبی ئەلهەیجا عەبدوللا کوڕی حەمدان کوڕی حەمدون) کرد بە والی لەسەر ویلایەتی موسل[٦٣] و داقوق یەکێك بوو لەو شارانەی سەر بە موسل بوو، بەمەش داقوق کەوتە ژێر دەسەلاتی دەولەتی حەمدانی، (ئەبی ئەلهەیجا) لە فەرمانڕەوایی موسل بەردەوام بوو تا لەلایەن خەلیفە (موقتەدیر باللە) لەسەر کار لابرا.

لە سالی (٣١٤)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٢٦)ی زایینیی ڕاپەڕینی کوردو عەرەب لە ویلایەتی موسلو ڕێگای خوراسان سەری هەلدا[٦٤] و کاروباری ویلایەتی موسلو پاراستنی لە ئەستۆی (عەبدوللا کوڕی حەمدان) بوو کە لە بەغداوە بەڕێوەی دەبرد، (ناسر ئەلدەولە)ی کوڕی لە موسل بوو لە نامەیەکا باوکی فەرمانی پێدا سەربازەکانی کۆ بکاتەوەو بەرەو تکریت بکەوێتە ڕێ، ئەویش فەرمانی باوکی جێبەجێکردو لە تکریت لەگەل باوکی کۆبووەوە، عەرەبەکانی کۆکردەوە دوای ئەوەی کۆمەلێکی لێیان کوشتو کۆمەلێکی سزاداو داوای کرد بە گێڕانەوەی هەموو ئەو کەلوپەلو پارەو سامانەی کە تالانیان کردبوو بۆ خاوەنەکانیان، پاشان بەرەو شارەزوور کەوتە ڕێ، چووە سەر کوردە جەلالییەکانو لەگەلیان بە شەر هات، بەلام بە گەیشتنی هاوکاری ژمارەی جەلالییەکان زیادی کردو هێزو توانایان بەزەبرتر بوو، بەلام کاتێ بەهێزی بەرامبەریان بینی وازیان لە ئاژاوە گێڕی هێنا[٦٥].

پێدەچێت سوپای حەمدانی بە داقوق تێپەڕ بووبێ کاتێ لە تکریتەوە بەرەو شارەزوورو ڕێگای خوراسان ڕۆیشت لەبەر ئەم هۆیانە:

١. داقوق پێگەیەکی ستراتیژی زۆر گرنگی هەبوو لە ڕووی سەربازیو ئابووریو هاتووچۆ[٦٦]، چونکە دەکەوێتە ناوەڕاستی ڕێگای نێوان تکریتو شارەزوور[٦٧]، هەروەها لە داقوقەوە ڕێگا هەبوو بەرەو شارەزوور[٦٨] و ڕێگایەکی کە بەرەو ڕێگای خوراسان[٦٩] دەچوو ئەمەش وایکرد داقوق ببێتە ناوەندێكو سەنتەرێك بۆ ئەو سوپایەی بەرەو شارەزوورو ڕێگای خوراسان دەڕۆیشتن، ئەم پێگەو شوێنە گرنگە بوو بە جێگای کۆکردنەوەو گەیاندنی ئازوقەو هاوکاریو حەوانەوە بۆ سوپای حەمدانییەکان.

٢. هۆزی جەلالییەکان بەشێك بوون لە هۆزەکانی داقوق[٧٠]، بۆیە پێویست بوو لەسەر (ئەبی ئەلهیجا) هێلەکانی پشتەوەی سوپاکەی بپارێزێ پێش بەڕێکەوتنی بەرەو شارەزوور.

لە سالی (٣١٧)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٢٩)ی زایینییو بە هۆی ئەو کودەتایەی کرایە سەر خەلیفە (موقتەدر باللە) ی عەباسیو هاتنی (ئەلقاهیر باللە) بۆ سەر تەختی خەلافەت کۆمەلێ شاری دیکەی بە (ئەبی ئەلهیجا) بەخشیو خستییە ژێر دەسەلاتیو داقوق یەکێك بوو لەو شارانە[٧١]، بەلام (ئەبی ئەلهیجا) دلخۆشی بەم بەخشینە زۆری نەخایاند چونکە دەسەلاتی (ئەلقاهیر باللە) دوو ڕۆژ زیاتری نەخایاند[٧٢].

دوای هاتنی بوەیهییەکانو داگیرکردنی بەغدا لە سالی (٣٣٤)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٤٥)ی زایینییو بە پێی مەرجەکانی ئەو ڕێکەوتنامەیەی نێوان حەمدانییەکانو بوەیهییەکان کە لە سالی (٣٣٥)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٤٥) ی زایینیی مۆرکراو لە یەکێك لە خالەکانی تێدا هاتووە ئەو ناوچانەی لە تکریت بەرەو باکوور لەژێر دەسەلاتی حەمدانییەکان دەبێت[٧٣]، بەمەش داقوق بەشێك بوو لە دەولەتی حەمدانی، تاکو سالی (٣٦٧)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٧٧)ی زایینیی) لەم سالەدا میر (عەزود ئەلدەولە)ی بوەیهی بەرەو موسل کەوتە ڕێو توانی ویلایەتی موسل هەمووی داگیر بکات دوای ئەوەی بەسەر (ئەبو تەغلوب کوڕی ناسر ئەلدەولە)ی حەمدانیو (بەختیار کوڕی موعیز ئەلدەولە)[٧٤] ی بوەیهی کوڕی مامی سەرکەوێ[٧٥].

*** داقوقو دەولەتی بوەیهی:**

بوەیهییەکان خێزانێکی (دەیلەم)ن[٧٦]، ڕەچەلەکیان دەگەڕێتەوە بۆ (بوەیهی کوڕی فەنا خەسرەو) کە سێ کوڕی هەبوو ئەوانیش (عەلی) کە نازناوی (عیماد ئەلدەولە) بوو (٣٢٢ - ٣٣٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٣٢ - ٩٤٦)ی زایینیی و (حەسەن) کە نازناوی (ڕوکن ئەلدەولە) بوو (٣٣٠ - ٣٦٦) ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٤١ - ٩٧٦)ی زایینییو (ئەحمەد) کە نازناوی (موعز ئەلدەولە) بوو (٣٢٠ - ٣٥٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٣٢ - ٩٧٦)ی زایینیی[٧٧]، توانییان بگەنە پلەو پایەیەکی بەرز بە هۆی ئەزمونی سەربازییانەوە[٧٨] و دەسەلاتیان لە سالی (٣٢٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٣٤)ی زایینیی دەستی پێکرد کاتێ (عەلی کوڕی بوەیهی) دەستی گرت بەسەر (فارس)دا[٧٩] و لەلایەن خەلیفەی (ئەلرازی باللە) ی عەباسی خەلاتکراو کرا بە والیو فەرمانڕەوایی فارس[٨٠]، بوەیهییەکان دەستیانکرد بە فراوانکردنی دەسەلاتیان تاکو توانیان بچنە ناو بەغداوە لە مانگی (جەمادی ئاخیرە) ی سالی (٣٣٤)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٤٥)ی زایینیی[٨١] و دەولەتەکیان بەردەوام بوو تا سالی (٤٤٧)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٥٥)ی زایینیی تا ڕووخانی لەسەر دەستی سەلجوقییەکان[٨٢].

پەیوەندی داقوق بە بوەیهییەکانەوە بۆ ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ڕووداوەکانی سالی (٣٦٩)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٧٩)ی زایینیی کاتێ (عەزود ئەلدەولە)ی بوەیهی توانی دەستبگرێ بەسەر هەموو ویلایەتی موسل[٨٣] و یەکەم ئاماژە کە دەربارەی داقوق هاتووە لەم سەردەمە بۆ ڕووداوەکانی سالی (٣٦٩)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٧٩)ی زایینیی دەگەڕێتەوە کاتێ (بەنو شەیبان) دەستیانکرد بە تالانو دزیو چەتەکردنو ئەمەش پالی نا بە (عەزود ئەلدەولە) هێزێك دژیان ئامادە بکات بە سەرۆکایەتی (ئەبی جەعفەر ئەلوازەری) کە لە ڕێگا بەرەو شارەزوور دەڕۆیی کۆچی دوایی کردو (عەزود ئەلدەولە) لە جێی ئەو (ئەبی ئەلعەلا)ی نارد بۆ سەرکردایەتی کردنی سوپاکە کە توانی بچێتە ناو شارەزوورەوە بەلام (بەنو شەیبان) توانییان هەلبێن بەرەو باکوورو (ئەبی ئەلعەلا) گەڕایەوەو لە داقوق سەربازگەی دانا بۆ زیاتر لە چوار مانگو دەستیکرد بە کارهێنانی فێلو تەلەنانەوە بە هیوای نزیك کردنەویان تا لە کۆتاییدا توانی پەلاماریان بداتو دوو سەد

کەسیان لێبکوژێت و هەشت سەد لە پیاو ماقوڵانیان بەدیل بگرێ[٨٤].

پاش ئەم ڕووداوە تا ساڵی (٣٨٧)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٩٧)ی زایینی سەرچاوەکان بێدەنگ ئەبن لە باسکردنی داقوق و نازانین هەر لەژێر دەسەڵاتی بوەیهییەکان ماوەتەوە یا نا، دوای ساڵی (٣٨٧)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٩٧)ی زایینی داقوق کەوتە ژێر دەسەڵاتی هەردوو میرنشینی (عەقیلی) پاشان میرنشینی (عەنازییەوە)[٨٥].

لە ساڵی (٤٠١)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠١٠)ی زایینی و دوای مردنی وەزیر (عەمید ئەلجیوش)[٨٦] (فەخر ئەلمەلیك ئەبو غالیب)[٨٧] جێگای گرتەوە لە بەڕێوبردنی کاروباری عێراق لە جیاتی (بەهائولدەولە) (٣٧٩ – ٤٠٣)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٨٩ – ٩٩٧)ی زایینی[٨٨]، لە ساڵی (٤٠٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠١١)ی زایینی هێزێکی ئامادەکردو هێرشی کردە سەر میرنشینە دراوسێکان لە وانەش میرنشینی (عەنازی)و میرنشینی (عەقیلی)[٨٩] کە ئەو کاتە داقوق لەژێر دەسەڵاتیدا بوو، هەروەکو لەڕووداوەکانی ئەو ساڵدا هاتووە وەزیر (فەخر ئەلمەلیك ئەبو غالیب کوڕی خەلەف) هەستا بە ناردنی (فاخیر کوڕی ئەبی ئەلوەفا کوڕی عەبدوڵلا ئەلتورکی) کە یەکێك بوو لە سەرکردەی تورکەکان، بۆ داقوقاو خانیجارو کەرخ جدان لەگەڵ فەرمانبەری نوێنەری بۆ بەڕێوەبردنی[٩٠]، بەمەش جارێکی تر داقوق کەوتە ژێر دەسەڵاتی بوەیهییەکانەوە، بەڵام ئەم دەسەڵاتە زۆری نەخایاند چونکە (جیبرائیل کوڕی محەمەد) بە یارمەتی یەکێك لە میرە کوردەکان کە ناوی (موسەك کوڕی جکۆیە) بوو توانی داقوق بەگەڕێنێتەوەو داروودەستەی (فەخر ئەلدەولە)ی بوەیهی دەربکا[٩١].

### * دەست بەسەراگرتنی (جبرائیلی کوڕی محەمەد) بەسەر داقوق:

لە سەردەمی خەلیفە (ئەلقادر باللە)ی عەباسی (٣٨١ – ٤٢٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٩١ – ١٠٣١)ی زایینی (جبرائیل کوڕی محەمەد) توانی دەست بەسەر داقوقدا بەگرێ، (جبرائیل) هێزی پیادەی فارسەکان بوو لە بەغداو لە خزمەتی (موهەزیب ئەلدەولە ئەبو ئەلحەسەن عەلی کوڕی نەسر) (٣٣٥ – ٤٠٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٤٦ – ١٠١٧)ی زایینی فەرمانڕەوای (ئەلبەتیحە)[٩٢] کاریکرد بوو، (جبرائیل) بۆ غەزاکردن بەڕێکەوت (غەزاکردنی وڵاتی ڕۆم)و کەسانێکی زۆری کۆکردەوەو چەکی کڕی و بەڕێکەوت، لە ڕێگا بە داقوقا تێپەڕی و بینی (موقولید کوڕی ئەلموسەیەب ئەلعەقیلی) داقوقی گەمارۆ داوەو خەڵکەکەشی هانایان بۆ بردو داوای یارمەتیان لە (جبرائیل) کرد، ئەویش بە هانایانەوە چوو بۆ پاراستنیان، لە داقوقا دوو پیاوی مەسیحی هەبوو توانیان بەسەر شارەکە زاڵبن و خەڵکەکە بکەن بە کۆیلە[٩٣]، ئەو دوو پیاوە خەڵکەکەیان دەچەوسانەوە زیاتر لە چەوساندنەوەی ڕۆم ئەگەر وڵاتەکەیان داگیر بکردایە[٩٤]. کۆمەڵێ لە موسڵمانەکانی داقوق لەگەڵ (جبرائیل) کۆبونەوەو پێیان ووت: (تۆ بۆ غەزا دەڕۆی، نازانی ئەگەیتە مەبەستی خۆت یان نا. ئێمە ئەو دوو مەسیحییە کۆیلەی کردوین، فەرمانمان پێئەکەن. جا ئەگەر بمێنیتەوە لەلامان و بمانپارێزی لێیان، ئەوە ئێمە یارمەتیت دەدەین)، لە مانگی (ڕەبیعی یەکەم) (جبرائیل) چووە ناو داقوقەوەو دوو پیاوە مەسیحییەکەی گرت و دەستیگرد بەسەر ماڵ و موڵکیان و بە دادپەروەری و بە چاکە ڕەفتاری دەکرد لەگەڵ دانیشتووانی شارەکە[٩٥].

ئەوەی بۆمان دەردەکەوێ لێرەدا کە ناوچەکە لە بارودۆخێکی نائارام و شێواودا بووە کە بۆتە هۆی ئەوەی دوو پیاوی مەسیحی حوکمرانی داقوق بکەن و موسڵمانەکانی تێدا بچەوسێنن و ئەم کارەش پاڵی بە موسڵمانانەوە نا کە پەنا بەرن بۆ (جبرائیل کوڕی محەمەد) کە بۆ غەزاکردنی ڕۆمانییەکان بە ڕێکەوتبوو، حوکمرانی کردنی داقوق لەلایەن دوو مەسیحییەوە ئەوە ئەگەیێنێت کە ڕێژەی مەسیحییەکان لە داقوق لەو ماوەیە زۆر بووەو ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە بتوانن حوکمی شارەکە بکەن.

لە ساڵی (٣٩٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٠١)ی زایینی (موقەلید کوڕی ئەلموسەیەب ئەلعەقیلی) دەست بەسەر داقوقدا دەگرێ و (جبرائیل کوڕی محەمەد)ی بۆ فەرمانڕەوایی لەسەر دانا، (سابی) دەڵێ: (لەم مانگدا مانگی شەوال لە ساڵی (٣٩٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٠١)ی زایینی هەواڵێ هاتووە کە دەڵێ (موقەلید کوڕی موسەیەب) (دقوقا) و (خانیجار)ی داگیر کردووەو (جبرائیل کوڕی محەمەد) ناسراوە بە (دەبوس ئەلدەولە)ی لەسەری داناوە)[٩٦]. لەم دەقەدا دەردەکەوێ کە (جبرائیل) بۆ ماوەی (٣) ساڵ و (٧) مانگ حوکمرانی داقوقی کردوە پێش ئەوەی بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی میرنشینی (عەقیلی)یەوە.

لەم ماوەیەدا داقوق ئارامی و حەوانەوەی بە خۆیەوە نەبینی چونکە هەر یەك لە (عەقیلی)یەکان و (عەنازی)یەکان و (بویهی)یەکان لە ململانێیەکی توند بوون لەسەر دەستگرتن بەسەر داقوق، تا (جبرائیل کوڕی محەمەد) جارێکی تر توانی دەستبەسەرەیدا بگرێ و داروودەستەی (فەخر ئەلدەولە)ی بوەیهی قاو بدات، ئەویش بەیارمەتی یەکێك لە میرە کوردەکان کە بەناوی (موسەك کوڕی جکۆیە)[٩٧] بوو بۆ گێڕانەوەی شاری داقوق، بە هەردووکیان سەرکەوتن لە دەستبەسەراگرتنی شارەکە[٩٨]. داقوقیش بەدەستی (جبرائیل) مایەوە تا هاتنی (بەدران کوڕی ئەلموقەلید) کە بەسەر هەردووکیان سەرکەوت و لێیانی سەندەوە[٩٩].

### * داقوق لەژێر سێبەری حوکمی میرنشینی (عەقیلی)یدا:

ئەم میرنشینە لە ڕۆژگاری خەلیفە (ئەلقادر باللە)ی عەباسی (٣٨١ – ٤٢٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٩١ – ١٠٣١)ی زایینی دامەزرا بە هۆی لاوازی میرنشینی (حەمدانی) یەوە، (ئەبو ئەلزوئاد کوڕی محەمەد ئەلموسەیەب ئەلعەقیلی) بە دامەزرێنەری ئەم میرنشینە دادەنرێ کە توانی لە ساڵی (٣٨٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٩٠)ی زایینی بچێتە ناو موسڵەوە[١٠٠]، دوای ئەوەی هەڵسا بە کوشتنی (ئەبو تاهیر ئیبراهیم کوڕی ناسر ئەلدەولە ئەلحەمدانی)و کوڕەکەی و ژمارەیەك لەو سەرکردانەی دوای کە پەنایان بۆی برد بوو

لە (نسێبین)[101]، (ئەبو ئەلزوئاد) دەسەڵاتێکی سەربەخۆی تەواوی نەبوو چونکە جێگرێکی لەلایەن (بەهائولدەولە)ی لەگەڵ بوو، بەڵام دەسەڵاتی راستەقینە تێدا لە دەستی (ئەبو ئەلزوئاد)دا بوو[102]، بەم شێوەیە میرەکانی بنەماڵەی (عەقیل) یەك لە دوای یەك حوکمرانی میرنشینەکەیان گرتە دەست، دەسەڵاتی ئەم میرنشینە بەردەوام بوو تا رووخانی لە ساڵی (٤٨٩)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٩٧)ی زاینیی[103].

لە ساڵی (٣٨٧)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٩٧)ی زاینیی (موقەلید کوڕی ئەلموسەیەب) هەوڵی داگیرکردنی داقوقی دا، هەستا بە گەمارۆدانی بەڵام نەیتوانی بچێتە ناوەوە، بە هۆی خەریکبوونی (موقەلید) بەو ململانێیەی کە لەنێوان خۆی و براکانی (عەلی و حەسەن) لەسەر دەسەڵاتی میرنشینەکە، لەو کات (جبرائیل کوڕی محەمەد) بە هاوکاری بەشێك لە دانیشتووانی داقوق توانی دەستبەسەریدا بگرێت[104]. بەڵام (موقەلید کوڕی ئەلموسەیەب) کۆڵی نەداو دووبارە هەوڵی دەستبەسەراگرتنی داقوقی دا، لە ساڵی (٣٩٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٠١)ی زاینیی توانی دەستبەسەر داقوقدا بگرێ کە لەژێر دەسەڵاتی (جبرائیل کوڕی محەمەد)دا بوو، (موقەلید) (جبرائیل)ی لەسەر داقوق داناو نازناوی (دەبوس ئەلدەولە)ی پێ بەخشی و بەمەش داقوق بوو بە بەشێك لە میرنشینی عەقیلی.

لێردا چەندین هۆکار هەیە کە پاڵی بە (موقەلید کوڕی ئەلموسەیەب)ەوە نا بۆ ئەوەی داقوق بخاتە ناو میرنشینەکەیەوە:

١. ئارەزووی فراوانخوازی میر (موقەلید)، دوای ئەوەی هەلی بۆ رەخسا بە مردنی (عەلی)ی برای و ئاشتبوونەوەی لەگەڵ (عەلی کوڕی مەزید ئەلئەسەدی)[105] کە ناسراو بوو بە (سەنەد ئەلدەولە) میری (حیلە) لە ساڵی (٤٠٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠١٨)ی زاینیی ئەویش لە رێگای (موهەزب ئەلدەولە) میری (بەتیحە) لە ساڵی (٣٩٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٠١)ی زاینیی بەمەش رزگاری بوو لە هەموو رکابەرە سیاسییەکانی و ئەم کارەش وای لێکرد خۆی تەرخان بکات بۆ فراوانکردنی میرنشینەکەی[106].

٢. داقوق بەشێك بوو لە میرنشینی (حەمدانی) جا لەبەر ئەوەی کە (عەقیلی)یەکان میراتگری (حەمدانی)یەکان بوون بۆیە ئاسایی بوو (موقەلید) هەوڵی دەسبەسەرگرتنی داقوق بدا.

٣. شوێنی ستراتیژی داقوق، چونکە بریتی بوو لە سنووری باشووری رۆژهەڵاتی موسڵ و جەزیرەو بە هێڵی بەرگری یەکەم بۆ موسڵ دادەنرا، جگە لەو گرنگییەی کە هەیبوو لە رووی ئابوورییەوە.

دەسەڵاتی میرنشینی (عەقیلی) بەسەر داقوق زۆر بەردەوام نەبوو، بە کوشتنی (موقەلید کوڕی ئەلموسەیەب) لە ساڵی (٣٩١)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٠٢)ی زاینیی داقوق لەژێر دەسەڵاتی (عەقیلی)یەکان دەرچوو، تا میر (قرواش کوڕی ئەلموقەلید) عەقیلی (٣٩١ – ٤٤٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٠١ – ١٠٥٠)ی زاینیی توانی داقوق دووبارە بگێڕێتەوەو بیخاتە سەر ماڵ و موڵکی میرنشینەکە. بەڵام وەزیری بوەیهیی (فەخر ئەلمەلیك ئەبو غالیب) توانی لە ساڵی (٤٠٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠١٢)ی زاینیی دەست بەسەر داقوق بگرێ[107]. بۆ جاری سێیەم میر (بەدران کوڕی ئەلموقەلید)[108] توانی داقوق بگێڕێتەوە ژێر دەسەڵاتی میرنشینی عەقیلی ئەویش دوای ئەوەی بەسەر (جبرائیل کوڕی محەمەد)و (موسەك کوڕی جکۆیە) سەرکەوت[109] بەڵام سەرچاوەکان ئاماژە بەو ساڵە ناکەن کە (بەدران) داقوقی گێڕاوەتەوە.

بەڵام وەکو دەردەکەوێ (بەدران کوڕی ئەلموقەلید) دەستی هەڵگرت لە داقوق بۆ کوڕەکەی (مالیك کوڕی بەدران) دوای ئەوەی دەستیگرت بەسەر (نسێبین) لە ساڵی (٤٢١)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٣٠)ی زاینیی[110]، مانەوەی (مالیك کوڕی بەدران) زۆری نەخایاند لە داقوق چونکە میری کوردی (ئەبو ئەلشەوك فارس کوڕی محەمەد کوڕی عەنان)ی (٤٠١ – ٤٣٧)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠١٠ – ١٠٤٥)ی زاینیی میری میرنشینی (شازنجانی) لە شارەزوورو هەرێمی شاخەکان توانی لە ساڵی (٤٢١)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٣٠)ی زاینیی دەستبگرێ بەسەر داقوق و لە دەستی میر (مالیك کوڕی بەدران) عەقیلی وەربگرێتەوە[111]، هەلی لاوازی میرنشینی عەقیلی و خەریکبوونیان بە گرفتە ناوخۆییەکان قۆستەوە، بەمەش داقوق لەژێر دەسەڵاتی میرنشینی عەقیلی دەرچوو ئیتر هیچ کەسێ لە میرەکانی نەیانتوانی دەسەڵاتیان بکشێنن بەسەر داقوقدا تا رووخانی میرنەشینەکەیان.

*** داقوق لەژێر سێبەری دەسەڵاتی میرنشینی (عەنازی)دا:**

ئەم میرنشینە لە (حەلوان)[112] دامەزرێنرا[113]، لەسەر بنەمای تیرەگەری (هۆزایەتی)و بە پشتبەستن بە هۆزی (شازنجان) کە شوێنەکەی دەکەوێتە هەرێمی شاخەکان[114]، بە تەواوی لەنێوان (حەلوان)و (قرمیسین – کرمان شاە)[115] و دامەزراندنی ئەم میرنشینە لە ساڵی (٣٨١)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٩١)ی زاینیی بوو[116] لەسەر دەستی (ئەبو ئەلفەتح محەمەد کوڕی عەنان)ی شازنجانی سەرۆکی هۆزی (شازنجان) کە بۆ ماوەی نزیکەی بیست ساڵ فەرمانڕەواییی کرد (٣٨١ – ٤٠١)ی کۆچی بەرامبەر بە (٩٩١ – ١٠١١)ی زاینیی توانی دەسەڵاتی میرنشینەکەی فراوان بکاو چەند شارو قەڵایەکی زۆری گرتەوە لە وانەش شاری (داقوق)[117]، کۆتایی ئەم میرنشینەش پاش (١٣٠) ساڵ لە فەرمانڕەوایی بوو[118]، لە ساڵی (٥١١)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١١٧)ی زاینیی کۆتایی پێ هات[119].

یەکەمین هەوڵی خستنە پاڵی داقوق بۆ سەر میرنشینی (عەنازی) لەلایەن میر (ئەبو ئەلفەتح محەمەد کوڕی عەنا) ی زاینیی بوو کە ویستی دەسەڵاتی میرنشینەکەی فراوان بکا، هەوڵەکانی خستەگەر بۆ دەرکردنی داقوق لەژێر دەستی میرنشینی (عەقیلی)یەکان، لە ساڵی (٣٩١)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٠١)ی زاینیی توانی دەستی بەسەرا گرت. (ئیبن ئەلئەسیر) دەڵێ: (دوایی موقەلیدی کوڕی ئەلموسەیەب دەستبەسەراگرت و لە دوای ئەویش (محەمەد کوڕی عەناز دەستی بەسەراگرت)[120]، وا دەردەکەوێ میر (ئەبو ئەلفەتح

محەمەد کوڕی عەنا)ی هەڵی کوشتنی میر (ئەلموقەلید کوڕی ئەلموسەیەب) لەو ساڵەو بەرپابوونی ناکۆکی لەنێوان میر (قرواش کوڕی ئەلموقەلید) و (ئەلحەسەن کوڕی ئەلموسەیەب)ی مامی قۆستەوەو کەشێکی گونجاوی بۆ دابین بوو توانی دەستبەسەر داقوق بگرێ لەو ساڵەدا[121]، بەڵام دەسەڵاتی (ئەبو ئەلفەتح) زۆر بەردەوام نەبوو چونکە خێرا میر (قرواش کوڕی ئەلموقەلید) توانی جارێکی تر داقوق بگێڕێتەوە[122].

لە ساڵی (٤٢١)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٣٠)ی زایینیی میر (ئەبی ئەلشەوك فارس کوڕی محەمەد کوڕی عەنان)ی هەڵسا بە گەمارۆدانی داقوق کە لە دەستی (ماڵیك کوڕی بەدران کوڕی ئەلموقەلید) بوو، دوای گەمارۆیەکی درێژخایەن (ئەبو ئەلشەوك) داوای لە (مالیك کوڕی بەدران) کرد شارەکەی رادەست بکاتو لە دەقی نامەکەی (ئەبو ئەلشەوك) بۆ (مالیك کوڕی بەدران) هاتووە: (ئەم شارە هی باوکم بووە، دەبێ بگەڕێتەوە بۆم، باشتر وایە دەستی لێ هەڵگری)، بەڵام میر (مالیك)ی عەقیلی قایل نەبوو بەرادەستکردنی شارەکەو (ئەبو ئەلشەوك)یش گەمارۆکەی بەهێزترو توندتر کرد تا توانی بچێتە ناو شارەکە، میر (مالیك) داوای سەلامەتی بۆ خۆیو ماڵو موڵکیو هاوڕێکانی کرد، بەڵام (ئەبو ئەلشەوك) تەنها بە خودی خۆیداو کاتێ هات بۆ لای (ئەبو ئەلشەوك) پێی ووت: (داوام لێکردی شارەکە بە ئارەزوو رادەست بکەیو خوێنی موسڵمانان بپارێزی بەڵام نەتکرد)، ئەویش پێی ووت: (ئەگەر بمکردایە عەرەبەکان ئابرووميان دەبرد بەڵام ئێستا ماومو نەنگیم لەسەر نییە)، (ئەبو ئەلشەوك) ووتی: (باشترین کار ئەوەیە ماڵو موڵکو هاوڕێکانت رادەستبەکەم)و (ئەبو ئەلشەوك) ئەوەی کە (مالیك) هەیبوو پێیداو بە سەلامەتی لە داقوق دەرچوو[123]، بەمەش داقوق بوو بە بەشێك لەماڵو موڵکی میرنشینی (عەنازی).

دوای گێڕانەوەی داقوق لەلایەن (ئەبو ئەلشەوك)، داقوق بوو بە بەشێك لە موڵکەکانی براکەی (ئەبی ئەلماجد ئەلموهەلهەل کوڕی محەمەد) (٤٣٧ – ٤٤٤)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٤٦ – ١٥٠٣)ی زایینیی، بەڵام سەرچاوەکان ئاماژە بەوە ناکەن ئایا (ئەبو ئەلشەوك) خۆی دەستی هەڵگرتووە لە داقوق، بۆ (موهەلهەل)ی برای یا ئەم بە زۆر لێی سەندەوە، بەڵام لە میانی ڕێڕەوی ڕووداوە مێژووییەکان واپێدەچێت (ئەبو ئەلشەوك) خۆی داقوقی بە (موهەلهەل)ی برای بەخشی بێت، چونکە لەسەرچاوەکاندا ئاماژە نەکراوە بە خراپبوونی پەیوەندی لەنێوان ئەم دوو برایە تا ساڵی (٤٣٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٤٠)ی زایینیی چونکە هەر لە هەمان ساڵدا شەڕ لەنێوان (ئەبی ئەلفەتح کوڕی ئەبو ئەلشەوك)و مامی (ئەبی ئەلماجد ئەلموهەلهەل) بەرپابوو کە توانی برازاکەی بەدیل بگرێ[124]، ئەم کارەش بووە هۆی ناکۆکی لەنێوان (ئەبو ئەلشەوك)و (موهەلهەل)ی برای، (ئەبو ئەلشەوك) لەشکرێك بەسەرکردایەتی (سەعدی)[125] کوڕی نارد بۆ دەستبەسەراگرتنی داقوقو گەمارۆیدا، بەڵام دانیشتووانەکەی بەرهەڵستی هێرشبەرەکانیان کردو بەرگرییان لە شارەکە کرد، دوای سەرنەکەوتنی (سەعدی) (حوسام ئەلدەولە کوڕی ئەبو ئەلشەوك) بە سوپایەکەوە بەرەو داقوق بەرێکەوتو گەمارۆیداو شوورەکەیان کوونکرد بە زۆر چوونە ناو داقوقو سوپاکەی شارەکەیان تاڵان کردو چەکو کەلوپەلی کوردەکانیان بردو شەوێك لەوێ مانەوەو لە ترسی دەست درێژ کردنەسەر (بەندنیجین)و (حەلوان) گەڕایەوە، چونکە میر (سەرخاب)ی[126] برای پەلاماری چەند شوێنێکی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دابوو، میر (سەرخاب) هاوپەیمانی کردبوو لەگەڵ (ئەبا ئەلفەتح کوڕی ورامی ئەلکوردی ئالجاوانی)[127] سەرۆکی خێڵی (جاوانی)[128] کە نیشتەجێی ناوچەکانی حیللەو کەناری ڕۆژهەڵاتی دیجلە بوون دژی (ئەبو ئەلشەوك)ی برای[129]، دوای کشانەوەی (ئەبو ئەلشەوك) لە داقوق، (سەرخاب) ئەم هەڵەی قۆستەوەو توانی دەستبەسەر داقوقدا بگرێ[130] وا دەردەکەوێ (سەرخاب) هەڵی ناکۆکی نێوان هەر دوو براکەی (ئەبو ئەلشەوك)و (موهەلهەل)ی قۆستەوەو داوای یارمەتی کرد لە (عەلائولدەولە کوڕی کاکویە) (خاوەنی ئەسفەهان)و توانی (دینەوەر)و (قرمیسین) داگیر بکات[131].

دوای هاتنی سەلجوقییەکان بۆ ناوچەکە میر (ماجد موهەلهەل) کە لە شارەزوور بوو و بە باشی زانی کە ئاشتبوونەوە بکا لەگەڵ ئەم سەرکردە نوێیەدا کە (تەغرلبەگی سەلجوقی) بوو (٤٢٩ – ٤٥٥)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٣٧ – ١٠٦٢)ی زایینییو دڵسۆزی خۆی بۆ رابگەیێنێت، بۆیە لە ساڵی (٤٤٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٥٠)ی زایینیی چوو بۆ لای (تەغرلبەگ) ئەویش بە خێرهاتنی کردو لەسەر ناوچەکانی هێشتییەوەو لەوانەش (سیروان)[132]و (داقوق)و (شارەزوور)و (سامغان)[133]و لێشی پارایەوە بۆ (سەرخاب کوڕی محەمەد)ی برای کە لەلای بەندکرا بوو[134].

دەبینین سەلجوقییەکان سیاسەتێکیان پەیرەوکرد ئەویش هێشتنەوەی میرو دەرەبەگ بوو لەسەر ئەو زەویو زارانەی کە لە لایان بوو بۆ بەکارهێنانی وەکو هۆکارێ بۆ پاراستنی ئاسایش لەو ناوچاندا[135].

لە سەردەمی هەردوو میر (شەرەف ئەلدەولە سەعدی کوڕی ئەبو ئەلشەوك) (٤٤٥ – ٤٤٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٥٣ – ١٠٥٤)ی زایینییو میر (بەدر کوڕی موهەلهەل) (٤٤٦ – ٤٦٧)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٥٤ – ١٠٧٤)ی زایینیی لە سەرچاوەکاندا هیچ ئاماژەیەك یا هەواڵێك لەسەر داقوق نەهاتووە.

لە سەردەمی میر (سەرخاب کوڕی بەدر کوڕی موهەلهەل)ی شازنجانی (٤٦٧ – ٥٠٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٧٤ – ١١٠٧)ی زایینیی شارو قەڵایەکی زۆر کەوتە ژێر دەسەڵاتیو لە وانەش شاری داقوق بوو کە لەژێر دەسەڵاتی مایەوە تا کۆتای دەسەڵاتی، میر (سەرخاب) توانی لە ساڵی (٤٩٥)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٠٢)ی زایینیی دەسەڵاتی بەگێڕێتەوە بەسەر قەڵای (خەفتیزەکان)[136] ئەوەش دوای ئەو شەڕەی کە ڕوویدا لەنێوانی خۆیو (قەرابلی) لە هۆزی سەلغەری تورکمانی بە هۆی قەدەغەکردنی میر (سەرخاب) بۆ (قەرابلی) لە بەکارهێنانی لەوەڕگاکانی ئەو ناوچانەی ژێر دەسەڵاتی میر (سەرخاب) بوونو کۆمەڵێکی لێکوشتن، (قەرابلی) داوای یارمەتی لە تورکمانەکان کردو ئەوانیش بەهانایەوە هاتن

ئەنجامی شەرەكەش لەنێوان هەردوولا ڕوویداو شكانی (سەرخاب)و كوشتنی نزیكەی دوو هەزار لە پیاوەكانی بوو و دەستبەسەراگرتنی (قەرابلی)ش بەسەر هەموو وڵاتی (سەرخاب)دا بوو جگە لە داقوق و شارەزوور[١٣٧].

لەنێوان ساڵانی (٥٠٠)ی كۆچی بەرامبەر بە (١١٠٧)ی زاینیی و تاكو ڕووخان و لە ناچوونی میرنشینی (عەنازی) لە ساڵی (٥١١)ی كۆچی بەرامبەر بە (١١١٧)ی زاینیی لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی میر (ئەبو مسەور كوڕی بەدر)[١٣٨] لە سەرچاوەكاندا هیچ ئاماژەیەك دەربارەی (داقوق)مان دەست نەكەوتووە تاكو بزانین لە ژێر دەسەڵاتی میرنشینی (عەنازی) ماوە یاخود لێی جیابووەتەوە.

### * زاڵبوونی سەلجوقییەكان بەسەر داقوق:

لە ساڵی (٤٢٩)ی كۆچی بەرامبەر بە (١٠٣٧)ی زاینیی دەوڵەتی سەلجوقییەكان دامەزراو[١٣٩] سوڵتان (تەغرلبەگ) ی سەلجوقی بە دامەزرێنەری دادەنرێ كە توانی لە ساڵی (٤٤٧)ی كۆچی بەرامبەر بە (١٠٥٥)ی زاینیی بچێتە ناو بەغداوە و[١٤٠] دەسەڵاتی سەلجوقییەكان بەردەوام بوو تا ساڵی (٥٠٩)ی كۆچی بەرامبەر بە (١١٩٣)ی زاینیی بە كوشتنی سوڵتان (تەغرل كوڕی ئەلب ئەرسەلان شا) میرنشینەكەیان لەناوچوو[١٤١].

داقوق لەم سەردەمە بەشێك بوو لە میرنشینی (عەنازی)، دوای ئەوەی ئەم میرنشینە سەرئێشەی لەلایەن سەلجوقییەكانی چەشت و دروستبوونی ململانێی نێوان میرەكان بنەماڵەی (عەنازی)، میر (موهەلهەل كوڕی محەمەد) بۆی دەركەوت كە ناتوانێ ڕووبەڕووی سەلجوقییەكان ببێتەوەو باشتر وایە ئاشتبوونەوە بكا لەگەڵ سوڵتان (تەغرلبەگ)و ملكەچی خۆی بۆ بنوێنێ بۆ پاراستنی میرنشینەكەی بەتایبەتی دوای ئەوەی ناوچەكە زۆر بەسەرهاتی لەسەر دەستی میر (ئیبراهیم ئەنال)ی بینی، بۆیە میر (ئەبی ئەلماجد ئەلموهەلهەل)ی عەنازی لە ساڵی (٤٤٢) ی كۆچی بەرامبەر بە (١٠٥٠)ی زاینیی چوو بۆ لای سوڵتان (تەغرل) ئەویش پێشوازی لێكردو لەسەر ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی هێشتییەوە لەوانەش داقوق بوو[١٤٣]، بە ملكەچ كردنی میر (موهەلهەل)ی عەنازی بۆ سەلجوقییەكان هەموو ماڵ و موڵكی میرنشینی عەنازی بە داقوقەوەش بوونە بەشێك لە دەوڵەتی سەلجوقی.

لە ڕووداوەكانی ساڵی (٤٨٦)ی كۆچی بەرامبەر بە (١٠٩٣)ی زاینیی دا هاتووە تێیدا: (میر (یەلبرد)[١٤٤] كوژرا لەسەر دەستی (برکیارۆق) (٤٨٦ - ٤٩٨)ی كۆچی بەرامبەر بە (١٠٩٣ - ١١٠٤)ی زاینیی، خۆی و باوكی لە میرە گەورەكان بوون، (برکیارۆق) ناوچە بەخشراوەكانی (یەلبرد)ی زیادكرد بە پێدانی (كۆهرائین)[١٤٥] و (شحنكیە)ی بەغدا، بەڵام كاتێ گەیشتە داقوق گەڕێنرایەوە چونكە قسەی ناشرینی كردبوو سەبارەت بە دایكی سوڵتان (برکیارۆق) ەوە بۆیە پاش گەیشتنی كوژرا)[١٤٦]. هەروەها لە دەقەكەدا ئاشكرایە كە میر (یەلبرد) تەنها لە داقوقەوە تێپەڕی و بەشێك نەبووە لەو ناوچانەی كە سوڵتان (برکیارۆق) بۆی دابڕیبێ و بەپێچەوانەی ئەوەی كە (ڕۆژبەیانی) ئاماژەی بۆ كردووە[١٤٧]، چونكە داقوق تا ئەو كاتە لە ناوچەی دابڕاوەكان بوو بۆ میرنشینی (عەنازی)یەكان.

لە ساڵی (٥١٩)ی كۆچی بەرامبەر بە (١١٢٥)ی زاینیی داقوق خرایە ژێر دەسەڵاتی پاشا (تەغرل كوڕی محەمەد كوڕی مەلیكشا) ئەویش دوای ئەوەی میر (نور ئەلدەولە) (دوبەیسی كوڕی سەدەقە ئەلمەزیدی) میرێ حیللە لە شام (٥١٢ - ٥٢٩)ی كۆچی بەرامبەر بە (١١١٨ - ١١٣٤)ی زاینیی پەنای بردەبەر، پاشا (تەغرل) بە خێرهاتنی كردو لە ڕیزی پیاوە ماقوڵ و میرەكاندا داینا. بە هۆی خراپی پەیوەندی نێوان (دوبەیس)و خەلیفە، (دوبەیس) هانی پاشای (تەغرل) دا عێراق بكاتە مەبەست و خۆی بكا بە سوڵتانی، پاشا (تەغرل)و (دوبەیس)بەرەو عێراق ڕۆیشتن بە سوپایەكی زۆرەوەو گەیشتە داقوق و توانی دەستبەسەریدا بگرێ[١٤٨]، لە سەرچاوەكاندا هیچ ئاماژەیەك نییە بە بەرگریكردن یا ڕووبەڕووبونەوەی لە كاتێ چوونە ژوورەوەی هێزەكانی (تەغرل) بۆ ناو داقوق و پێدەچێت هۆیەكەی نەبوونی هێزی سەربازی تەواوە كە توانای پەرچدانەوەی ئەو مەترسیەی هەبێ لەسەری، لەو ماوەیەی نێوان ساڵەكانی (٥١٩)ی كۆچی بەرامبەر بە (١١٢٥)ی زاینیی هەتا (٥٣١)ی كۆچی بەرامبەر بە (١١٣٧)ی زاینیی سەرچاوەكان بێدەنگن لە باسكردنی داقوق و هیچ زانیارییەكمان دەربارەی نییە.

### * داقوق لەژێر سێبەری ئەتابەگی زەنگیدا:

ئەتابەگیەی زەنگی لەسەر دەستی (عیمادەدینی زەنگی كوڕی ئەقسەنقر) كە نازناوی (ئەلمەلیك ئەلمەنسور) پاشای سەركەوتوو بوو (٥٢١ - ٥٤١)ی كۆچی بەرامبەر بە (١١٢٧ - ١١٤٦)ی زاینیی دامەزرا دوای ئەوەی كە كرا بە والی موسڵ لە ساڵی (٥٢١)ی كۆچی بەرامبەر بە (١١٢٧)ی زاینیی[١٤٩] ئەویش بە هۆی ئەوەی كە توانا و بەهرەمەندی خۆی دەرخست لە بەڕێوەبردنی ویلایەتی بەسراو واست و شحنكیەی[١٥٠] بەغداو عێراق[١٥١]، (عیمادەدین) دوای ئەوەی دەسەڵاتی خۆی سەپاند بەسەر ئەو ناوچانەی كە لەژێر دەستیدا بوو كاریكرد بۆ ئەوەی شارو ویلایەتەكانی هەرێمی جەزیرەو شام بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی[١٥٢]، هەروەها گرنگی و بایەخی ئاراستەی شارو قەڵا كوردییەكانی دراوسێكانی كردو كاریكرد بۆ ئەوەی بیخاتە ژێر دەستی و دەسەڵاتی بسەپێنێت بەسەریاندا[١٥٣]، فەرمانڕەوایەتی ئەم ئەتابەگییە بەردەوام بوو تا ساڵی (٦٣١)ی كۆچی بەرامبەر بە (١٢٣٣)ی زاینیی و بە مردنی (ناسرەددین مەحمود كوڕی ئەلقاهیر عیزەددین)[١٥٤] لەناوچوو، لەو شارانەی كە (عیمادەدین زەنگی) هەوڵیدا بۆ ئەوەی بیخاتە ناو ئەتابەگی زەنگییەوە، شاری داقوق بوو تا لە ساڵی (٥٣١)ی كۆچی بەرامبەر بە (١١٣٧)ی زاینیی توانی دەستبەسەریدا بگرێ[١٥٥]، داگیركردنی داقوق لەلایەن ئەتابەگی زەنگییەوە بایەخێكی گەورەی هەبوو لەبەر ئەم هۆیانە:

١. پێگەی ستراتیژی شوێنی داقوق كە سنووری باشووری ئەتابەگییەی موسڵی پێكدەهێنا و هێڵی بەرگری

یەکەمی بوو. ئەم گرنگییە بەهێزتر بوو دوای ئەوەی گرژی کەوتە نێوان (عیمادەدین زەنگی)و سوڵتان (مەسعود ئەلسەلجوقی) (٥٢٧ – ٥٤٧)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٣٣ – ١١٢٥)ی زایینی کە ویستی (عیمادەدین زەنگی) بکوژێ[١٥٦]. مەترسییەکانی لەلایەن خەلیفە کەمتر بێ[١٥٧].

٢. هەستکردنی (عیمادەدین) بە مەترسی میرنشینی (قەفجاقی) کە (شارەزوورو قەڵای کەرخینی)[١٥٨] لەژێر دەسەڵاتیدا بوو، ئەو دەسەڵاتەی کە سەرۆکی میرنشینەکە هەیبوو کە میر (قەفجاق کوری ئەرسەلان تاش)ی تورکمانی بوو. (ئیبن ئەلئەسیر) دەڵێ: (دەسەڵاتی کاریگەر بوو بەسەر تورکمانەکاندا دوورو نزیك سەرپێچی قسەکانی نەدەکراو ملکەچی فەرمانەکانی بوون و پاشاکانش خۆیان لە قەرەی نەدەدا)[١٥٩]، هەروەها ترسی (عیمادەدین) لە ئاستی ئەو پەیوەندییەی کە هەبوو لەنێوان میر (قەفجاق)و سوڵتان (مەسعود) چونکە دەترسا میر (قەفجاق) دەست لە هەندێ موڵکی هەڵگرێ بۆ سوڵتان (مەسعود) بەمەش دەبێتە دراوسێی و مەترسییەکی راستەقینە دروست دەکا لەسەر ئەتابەگی موسڵ[١٦٠]، بۆیە وا پێدەچێت کە داگیرکردنی داقوق لەلایەن (عیمادەدین) پێش داگیرکردنی زەوی وزاری میرنشینی (قەفجاق) هەنگاوێکی پێشوەختانە بێ لە (عیمادەدین)ەوە بۆ گەمارۆدانی میرنشینی (قەفجاق)و دواتر پەلاماردانی.

٣. (عیمادەدین) درکی بەوە کرد کە ناتوانێ دڵنیابێ لەو پێشرەوییەی کە دەیکا بۆ شام و لە رووبەرووبونەوەی هێزی خاچپەرستەکان ئەگەر هەڵنەستێ بەدەستبەسەراگرتنی میرنشینە بچوکەکان و شارەکان (لەوانش داقوق) بۆ ئەوەی بەشی دواوەی سوپاکە (دەوڵەتەکەی) لە مەترسی هێرشی دوژمن بپارێزێ[١٦١].

لەبەر ئەم هۆیانە (عیمادەدین زەنگی) بە پێویستی دەبینی ئەم ناوچانە بخاتە ژێر دەسەڵاتیەوەو لە ساڵی (٥٣١) ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٣٧)ی زایینی توانی دەستبەسەر (داقوق)دا بگرێ دوای گەمارۆدانی و شەڕێکی زۆر گەورە کە لەسەر قەڵاکەی روویدا[١٦٢]، بەمەش داقوق بوو بە بەشێك لە ئەتابەگییەی موسڵ (ئەتابەگییەی زەنگی)و لە ساڵی (٥٤١) ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٤٧)ی زایینی (عیمادەدین زەنگی) داقوقی دابری بۆ میر (عیزەددین ئەلدوبەیسی) کە یەکێك بوو لە میرە گەورەکانی[١٦٣]. خەلیفە هەوڵی دا سنووری دابنێ بۆ فراوان بوونی دەسەڵاتی ئەتابەگییەتی زەنگی، دەبینین خەلیفە (ئەلموقتفی لیئەمر الله) (٥٣٠ – ٥٥٥)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٣٦ – ١١٦٠)ی زایینی لە ساڵی (٥٥٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٥٥)ی زایینی بەرەو داقوق کەوتە رێ بە هێزێکی گەورەوە بۆ داگیرکردنی[١٦٤]، گەمارۆیداو شەڕی لەگەڵ هێزەکەی ناویدا کرد پاشان داقوقی بەجێهێشت چونکە ئاگادارکرا کە سوپای موسڵ خۆیان ئامادەکردووەو بە رێکەوتوون بەرەو داقوق بۆ بەرگریکردن لێی، خەلیفە ناچار کشایەوە بە بێ ئەوەی بگاتە ئامانجی خۆی[١٦٥]. هەندێ لە مێژوونووسان دەڵێن: هۆی پاشەکشەکردنی خەلیفە لە داقوق بە هۆی ئەوەوە بوو خەڵکەکە پەنایان بۆ بردو داوایان لێکرد بروات بە هۆی ئەو دەردو مەینەتیەی کە هاتە سەریان ئەویش گەڕایەوە[١٦٦].

داقوق بە بەشێك لە موڵکی ئەتابەگییەتی (زەنگی) مایەوە تا ساڵی (٥٧٩)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٨٣)ی زایینی کاتێ خەلیفە (ئەلناسر لدین الله) لە هەمان ساڵدا توانی داقوق بخاتە ژێر دەسەڵاتی خیلافەتەوە ئەویش کاتێ ئەتابەگ (عیزەددین مەسعود کوری قوتبەددین مەودود) (٥٧٦ – ٥٨٩)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٨٠ – ١١٩٣)ی زایینی کە ئەتابەگی موسل بوو هەڵسا بە بەندکردنی جێگرەکەی کە (موجاهیدەدین قایمان)ی بوو، ئەمەش بە هاندانی چەند میرێك لە ناحەزانی (موجاهیدەدین) کە هەوڵیاندا لەناوی بەرن و[١٦٧] ئەم کارە بوو بە هۆی هەڵوەشانەوەی ئەتابەگییەکان و دەرچوونی چەند ناوچەیەکی گرنگ لەژێر دەسەڵاتیان، چونکە میرەکانی ئەو ناوچانە لایەنگری (موجاهیدەدین قایمان)ی بوون، لەژێر دەستی (موجاهیدەدین قایمان)ی هەولێرو ئەو شارانەی سەر بە هەولێر بوون و (زەینەددین یوسف کوری زەینەدین عەلی) [١٦٨] لەسەر بوو جەزیرەی (ئیبن عومەر)[١٦٩] (سەنجەر شا) ی[١٧٠] لەسەر بوو و هەردووکیان نامەیان بۆ (سەلاحەددین) ناردو ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆیان بۆ نواند، داقوق کە جێگری تێیدا بووبوون بە بەشی خەلیفەی (ئەلناسرلدین الله) کە سوپایەکی ناردو گەمارۆیدا دەستی بەسەراگرت، بەم جۆرەش خاوەنی موسل لە ماڵ و موڵکی (موجاهیدەدین) هیچی دەستنەکەوت تەنها (شارەزوور)و (عەقر) نەبێ[١٧١].

ئەم ناوچانەش نەگەڕانەوە ژێر رکێفی ئەتابەگییەتی (زەنگی) تەنانەت هەتا پاش دەرکردنی (موجاهیدەدین قایمان)ی لە گرتووخانەو بەمەش داقوق کەوتە ژێر دەسەڵاتی خیلافەی (عەباسی)یەوە.

*** داقوق و ئەتابەگی (ئەربل):**

ئەتابەگییەتی (ئەربل) لەلایەن (زەینەددین عەلی کوچك کوری بەکتەکین) [١٧٢] دامەزرێنرا، (عیمادەدین زەنگی) ئەم ئەتابەگییەتەی پێ بەخشی[١٧٣]، چونکە رۆڵێکی کاریگەری هەبوو لە دامەزراندی ئەتابەگییەتی (زەنگی)، (زەینەددین) پۆستی جێگری هەبوو لەو ئەتابەگییەدا[١٧٤]، دوای مردنی (عەلی کوچك) لە ساڵی (٥٦٣)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٦٧) ی زایینی هەردوو کورەکەی حوکمی ئەتابەگییەتی (ئەربل) یان گرتە دەست کە (زەینەددین یوسف)و (موزەفەرەددین کۆکبری) کە دوا دەسەڵاتداری ئەم ئەتابەگییەتی هەولێر بوون، لەبەر ئەوەی کوری نەبوو رایسپارد کە ئەتابەگییەتی (ئەربل) رادەستی خەلیفە بکرێ دوای مردنی[١٧٥].

دەبارەی پەیوەندی داقوق لەگەڵ ئەتابەگییەی (ئەربل) لە سەرچاوە مێژووییەکاندا زانیارییەکی زۆرمان دەربارەی ئەم پەیوەندییە تەنها ئەو دەقەی کە باس لەوە دەکا کاتێك (عیزەددین مەسعود کوری قوتبەددین مەودود) (موجاهیدەدین قەیمان)ی دەستگیر کرد جێگری (موجاهیدەدین) لە داقوق گوێڕایەڵی و چوونە پاڵ خەلیفەی راگەیاند[١٧٦].

هەندێ لە توێژەرەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە داقوق بەشێك

بووە لە ئەتابەگییەی (ئەربل)، دەڵێن داقوق بەشێك بووە لەو ناوچانەی کە بەندەکانی ئەو ئاشتبوونەوەیە گرتویەتێوە کە بەسترا لەنێوان (سەلاحەددین)و (عیزەددین مەسعود)[١٧٧] کە لە یەکێك لە بەندەکانیدا هاتووە: (دەبێ عیزەددین مەسعود هەموو ئەو زەویانەی کە دەکەونە پشتی زابەوە (مەبەستی زابی خوارووە) لە شارو قەڵاو گوندو هەروەها شارەزوورو قەڵاکانیو ناوچەکانیو هەروەها ویلایەتی بەنی قەفجاقو ویلایەتی قەرابلیو بوازیجو عانە رادەست بکا)[١٧٨]، هەموو ئەم ناوچانە بە پێی راگەیاندنی (ئەربل) کە (سەلاحەددین) دەریکرد دەچێتە پاڵی ئەتابەگییەی (ئەربل)[١٧٩].

هەندێکی تر دەڵێن (موزەفەرەددین کۆکبەری) داقوقی کرد بوو بە بنکەیەك بۆ پەرچدانەوەی مەغۆڵەکان[١٨٠]، ئەم رایەشیان لەسەر بنەمای کۆبوونەوەی سوپای موسڵمانەکان بوو لە داقوق (هێزەکانی خەلیفەو هێزەکانی ئەربلو هێزەکانی موسڵ) لەسەر داوای خەلیفە لە ساڵی (٦١٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٢٠)ی زاینییو خەلیفە رابەرایەتی سوپاکەی دایە (موزەفەرەددین کۆکبەری).

هەروەها هەندێ لە توێژینەوە شوێنەوارییەکان ئاماژە دەکەن کە کاتی دروست کردنی منارەی داقوق دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سوڵتان (موزەفەرەددین کۆکبەری) ئەویش پاڵپشت بە شێوازی تەلارسازییەکەی جۆری ئەو نەخشاندنەی کە هەیە لەسەر منارەکە بە بەراوردکردن لەگەڵ منارەی (ئەربل)دا[١٨١].

*** گەڕانەوەی داقوق بۆ ژێر دەسەڵاتی خیلافەت (٥٧٩ - ٦٥٦) ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٨٣ - ١٢٥٨)ی زاینیی:**

لە سەردەمی خەلیفە (ئەلناسر لدین الله)ی عەباسی (٥٧٩ - ٦٢٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٨٣ - ١٢٢٥) ی زاینیی داقوق دووبارە گەڕایەوە دەسەڵاتی خیلافە[١٨٢]، ئەویش دوای ئەوەی ئەتابەگ (عیزەددین مەسعود کوڕی قوتبەددین مەودود) ئەتابەگی موسڵ جێگرەکەی خۆی گرت کە (موجاهیدەدین قایماز)ی بوو، واپێدەچێت کە (ئەبو ئەلفەتح ئەلشەهریاری) کە ساڵی (٥٨٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٩٠)ی زاینیی کۆچی دوایی کردووە داقوقی ڕزگار کردووە، (زەهەبی) دەڵێ: (بە سوپاییەکی سەرکەوتووەوە دەرچوو بەرەو داقوقا و ڕزگاری کرد)[١٨٣].

لە ساڵی (٥٨٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٩٠)ی زاینیی خەلیفە (ئەلناسر لدین الله) هێزێکی لە بەغداوە نارد بەسەرکردایەتی (نەجاح ئەلشەرابی) [١٨٤] بۆ داقوق[١٨٥] ئەویش دوای ئەوەی سوڵتان (توغرلی کوڕی ئەلب ئەرسەلان) (٥٧٢ - ٥٩٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٠٤ - ١١٧٧)ی زاینیی کە دوا پاشای سەلجووقییەکان بوو هەوڵی زیندووکردنەوەی دەوڵەتی سەلجوقی دا، دەسەڵاتی پتەوتر بوو و هێزێکی زۆری کۆکردەوەو دەسەڵاتی فراوانتر بوو، لە ساڵی (٥٨٣)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٨٧)ی زاینیی نامەیەکی بۆ بەغدا ناردو داوایای لە خەلیفە کرد کۆشکی سوڵتان ئاوەدان بکاتەوە، بەڵام خەلیفە ڕووخانی[١٨٦].

لە ساڵی (٥٨٤)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٨٨)ی زاینیی توانی سوپای خەلیفە لە نزیك (هەمدان) ببەزێنێ[١٨٧]. بۆیە واپێدەچێت ئامانجی ناردنی (نەجاحی شەرابی) لەلایەن (ئەلناسر لدین الله) بۆ داقوق بۆ بە هێزکردنی یەکێك لەو دەروازانە بووە کە لەوانەیە سوڵتان (توغرل) لێیەوە بەرەو بەغدا بەڕێ بکەوێ.

بە پێی ئەو دەقانەی کە لە سەرچاوە مێژووییەکان هاتووە دەبینین خیلافە داقوقی بەخشیوەتەوە بە چەند میرێك، داقوق دابرا بۆ هەردوو میر (تەقزبا)و (قەتەرمش)[١٨٨]، یەك لە دوای یەك هەروەکو هاتووە (ئەبو بەکر) کە ناسراوە بە (ئیبن ئەلمەرئە) جێگری پۆلیس بوو لە (باب ئەلنەوبی ئەلشەریف) و باوکی دەباخانەکەی گرتبووە ئەستۆ، ئارەزووی لە وەرگرتنی پلەو پایە هەبوو بۆیە لەگەڵ میر (تەقزبا) لە (داقوقا)و دواتریش لەگەڵ (قەتەرمیش) کاری کرد کە خاوەن بوێریو جەربەزەیی بوو[١٨٩].

هەروەها (داقوق)و (تکریت)و (ما بەین ئەلنەهرەین) بەخشران بە میر (فەلەکەددین سەنقەر ئەلتەویل) کە لاوێکی جوانو ڕەوشت بەرزو شکۆدارو بەڕێزو خاوەن کرداری باشو بەخشندەیەکی فراوان بوو، لە مانگی (ڕەبیعی ئەوەل) ی ساڵی (٥٩٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٠٠)ی زاینیی لە داقوق کۆچی دوایی کردو لەوێش بەخاك سپێردرا[١٩٠].

(ئیبن ئەلفەوتی) ڕووداوێکی خۆش دەگێڕێتەوە کە بووە هۆی ئەوەی (سەنقەر) فرمانڕەوایی داقوق بگرێتە دەست، لە کاتی باسکردنی لەسەر میر (محەمەدی کوڕی سەنقەری گویل) دەڵێ: (سەنقەر لە پیاوە نزیکەکانی خەلیفە (ئەلناسر لدین الله) بوو، ڕۆژێکیان ئاوی دەرژانە سەر دەستی ئەویش سابونەکەی لەدەست بەربوو و دانەیەکی تری پێداو ووتی (دقوق) (یا نزیك لەم وشەیە) کە بە زمانی تورك بەمانای (مریشك)ە ئەویش داقوقی پێبەخشیو وایزانی کە داوای دەکاو بەو جۆرەش داقوق لە دەستی مایەوە تا مردنی)[١٩١].

هەروەها داقوق دابرا بۆ میر (موعینەددین قی ئابە - ئیبن ئەلساعی) لە ڕووداوەکانی ساڵی (٦٠١)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٠٥)ی زاینیی دەڵێ: (لە جەمادی ئەلئاخیرەی ئەو ساڵە میری داقوق میر موعینەددین قی ئابە دەست بەسەرکراو ئەنجومەنێکی بۆ بەسترا بە ئامادەبوونی میرە بەناوبانگەکانو پیاو ماقوڵانی دەوڵەت)[١٩٢]. پاشان داقوق بەخشرا بە میر (ئەرغەش)و[١٩٣] هەروەکو باسکراوە: (لە ساڵی (٦٠١)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٠٥)ی زاینیی کچی ئەرغەش میری داقوق کە هاوسەری میر (جەمالەددین قوشتمر)[١٩٤] بوو بە نەخۆشی سیل کۆچی دوایی کرد)[١٩٥].

هەروەها لە سەرچاوەکاندا هاتووە کە وەزیر (ئیبن ئەلمەهدی) [١٩٦] بەڕێوەبردنی (داقوق)و (دجێل)ی سپاردە پیاوێکی مەسیحی کە بە (ئەبی ئەلغەنائم نەسر کوڕی ساوی ئەلکیتاب) ناسرا بوو کە زوڵمو ستەمێکی زۆری بەرامبەر موسڵمانەکانی دەکرد، وەك وەزیرو گەورە پیاوانی دەوڵەت هەڵسوکەوتی دەکردو کاتێ کە دەردەچوو بەسوارەوە خەڵکی بە پێیان لەگەڵیا دەڕۆیشتن، هەموو باجو خەراجی ئەو ناوچەیە بۆ وەزیر (ئیبن ئەلمەهدی) دەبردو ئەویش پاش ئەوەی بەشێك لەو باجانە بۆ خۆی گلدەدایەوەو

ئەوەی دەمایەوە ئەیدایە خەلیفە، کاتێ خەلیفە بە خیانەتی وەزیرەکەی زانی (داقوق)و (دجێلی) بەخشیە (تەنامش) بەوەی (ئیبن ساوی) لەگەڵیا بمێنێ بە هۆی شارەزایی بە ناوچەکانی ئەو دوو ویلایەتە، لە ساڵی (٦٠٤)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٠٧)ی زاینیی (تەنامش) چووە ناو داقوق و لە کاروباری ناوچەکەی کۆڵییەوەو ئەم کارە وەزیر (ئیبن ئەلمەهدی) ترساند، (ئیبن ئەلمەهدی) لەگەڵ (ئیبن ساوی) رێککەوتن (تەنامش) ژەهرخوارد بکەن، (ئیبن ساوی) توانی (تەنامش) ژەهرخوارد بکاو دوای چەند رۆژێك لە بەغدا کۆچی دوایی کرد. خەلیفە فەرمانیدا مزگەوتی کۆشك بکرێتەوەو هەموو پیاوانی دەوڵەت ئامادەی پرسەکە ببن و کەس دوانەکەوێت، تەرمەکەی لە گۆرستانی (موسا کوری جەعفەر) بە خاك سپێردرا. کاتێ خەلیفە بە پلانەکەی زانی فەرمانیدا (ئیبن ساوی) بدرێتە دەستی غوڵامەکانی (تەنامش)، (ئیبن ئەلمەهدی) وەزیر نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسی کە مەسیحییەکان پەنجا هەزار دینارو خۆیشی دە هەزار دینار دەدەن تا (ئیبن ساوی) لە مردن رزگارکەن، بەڵام خەلیفە لەسەر وەرەقەکە نووسی: (ان الاسود اسود الغاب همتها یوم الکریهة في المسلوب لا السلب)، پاشان (ئیبن ساوی) تەسلیمی غوڵامو پیاوانی (تەنامش) کرا، (ئیبن ساوی) بەساڵاچوویەکی روخسار جوانو نیشانەی نازو نیعمەتی پێوە دیار بوو، هەردوو دەستیو پێیان بریو لە بەرامبەر ماڵی میر (تەنامش) هەڵواسراو پاش لە خاچدانی سوتێنراو بە کۆڵانەکاندا راکێشرا[197].

لە ساڵی (٦٣٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٣٣)ی زاینیی داقوق بەخشرا بە میر (حوسامەددین ئەبو فیراس جەعفەر کوری ئەبی فراس)[198]ی کوردی چاوانیو لە سەردەمی خەلیفە (ئەلناسر لدین الله) میری حەج بوو، پەنای برد بۆ (ئەلمەلیك ئەلکامل محەمەد ئەلئەیوبی) (٦١٥ – ٦٣٥)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢١٨ – ١٢٣٧)ی زاینیی لە ترسی وەزیری (قومی)[199]، کاتێ هەواڵی لەسەر کار لابردنی (قومی) پێگەیشت نامەیەکی بۆ دیوانی خەلافەت نووسیو رووخسەتی گەرانەوەی خواستو داواکارییەکەی قبوڵکرا، کاتێ گەیشتە بەغدا چوو بۆ لای (نەسیرەددین کوری ئەلناقد) [200] جێگری وەزیرو بەخشیە سەریو گەرایەوە بۆ ماڵی لە بازاری عەجەم، پاش چەند رۆژێك بانگهێشتکرا شمشێرێکی بە ئاڵتون رازێنراو و سواری ئەسپێ کراو حەوت بارو ئاڵاو کۆمەڵێ سەربازو داقوقی پێ بەخشرا[201]. لە سەردەمی خەلیفە (ئەلزافیر بیئەمر الله) باجو خەراجی داقوق بۆ بەغدا رەوانەدەکرا[202].

لە ساڵی (٦٤٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٤٢)ی زاینیی داقوق بەخشرا بە (قوتبەددین سەنجەر ئەلسەنقەری)[203] لە کاتی کە بەخشین بە سەر میرەکان دەبخشرا بە بۆنەی وەرگرتنی (ئەلموستەعسم باللە)ی عەباسی (٦٤٠ – ٦٥٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٤٢ – ١٢٥٨)ی زاینیی تەختی خەلافەت[204].

(ئیبن ئەلفەوتی) لە رووداوەکانی ساڵی (٦٤٤)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٤٦)ی زاینیی میر (محەمەد کوری سەنقەر ئەلتەویل)[205] میری داقوق کۆچی دوایی کرد[206]. لە سەردەمی خەلیفە (ئەلموستەعسم باللە) (عەمیدەددین ئەبی ئەلموزەفەر کوری ئەحمەد ئەلدوجێلی ئەلسەدر) کە لە ساڵی (٦٥٤)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٥٦)ی زاینیی کۆچی دوایی کردووە میری داقوق بووەو هەروەها رێگای (خوراسان)و (خالس)و[207] (رازان)و (تکریت) لەژێر دەسەڵاتی بوو[208].

بەپێی ئەو دەقانەی کە لە سەرچاوە مێژووییەکان هاتووە ئەبینین داقوق گەرایەوە ژێر چەترو دەسەڵاتی خەلافەت لەنێوان ساڵی (٥٧٩)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٨٣)ی زاینیی تاکو ساڵی (٦٥٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٥٨)ی زاینییو دەستنیشانکردنی میرەکانی داقوق لەلایەن خەلیفەوە دەکرا.

*** هێرشی ( جەلالەددین خەوارزم شا ) بۆ سەر داقوق:**

ئەم دەوڵەتە لە هەرێمی (خەوارزم)[209] دامەزرا لەنێوان ساڵانی (٤٩٠ – ٦٢٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٩٧ – ١٢٣٠)ی زاینییو لە سەرەتاوە کۆیلەیەکی تورکی لە پیاوەکانی سەلجوقییەکان ناوی (محەمەد کوری ئەنوشتکین) بوو (٤٩٠ – ٥٢١)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٩٧ – ١١٢٧)ی زاینییو[210] نازناوی (خەوارزم شا)ی لێنرا[211]. لە سەرەتای دامەزراندنی سەر بەدەوڵەتی سەلجوقی بوو تاکو ساڵی (٥٤٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (١١٥٣)ی زاینیی لە سەردەمی (خەوارزم شا ئیتز)ی سەربەخۆیی خۆی راگەیاند، دوای خۆی کورەکانی دەسەڵاتی پاشایەتییان وەرگرت، بە کوشتنی (جەلالەددین منکبرتی) (٦١٧ – ٦٢٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٢٠ – ١٢٣٠)ی زاینیی دەوڵەتی (خەوارزم) لەناو چوو[212].

بە هۆی راودونانی مەغۆلەکان بۆلای (جەلالەددین – خەوارزم شا)و تێکچوونی پەیوەندی لەگەڵ خەلیفە[213] (خەوارزم شا) رووی‌کردە داگیرکردنی ئەو شارانەی سەر بە خلافە بوون. لە ساڵی (٦٢٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٤٢٥)ی زاینیی گەیشتە (خوزستان – ئەهواز)و شاری (تستر)ی[214] گەمارۆدا بۆ ماوەی دوو مانگو نەیتوانی داگیری بکاتو لەوێشەوە رووی‌کردە (بەعقوبا)و[215] لەوێوە بەرێکەوت بەرەو (داقوق)و[216] لە مانگی (رەبیع ئەلئەوەل) گەیشتە ئەو شارە[217]، سوڵتان (جەلالەددین منکبرتی) بەنیاز بووە بەرەو (ئازەربێجان) بېرواتو کاتێ لە (داقوق) نزیك دەبێت دانیشتووانی داقوق چوونەتە سەر شورای شارەکە گەلێك جنێویان بە خەوارزمییەکان داوەو دەستیان کردووە بە تەکبیردان، بە هۆی هێرشکردنو پەلاماری خەوارزمییەکان بۆ سەر شارەکانی سەر بە خەلافەت[218]. ئەمەش لای سوڵتان (جەلالەددین) زۆر سەختو گران بوو و خستییە نارەحەتیو شارەکەی گەمارۆداو دەستوبردی کرد لە شەرکردن لەگەڵیانو خەڵکی (داقوق)یش بەرپەرچی هێرشەکەیان دایەوە، دوای شەرێکی سەخت بە زۆر سوڵتان توانی شاری داقوق داگیر بکات[219]. بە شمشێر کەوتە گیانی خەڵکەکەو شارەکەی سووتاند[220]، پارەو پولو ماڵیانی تاڵان کردو ئافرەتاکانی بەدیل گرتو دەستدرێژییان کردەسەریانو خەڵکێکی زۆری لێ کوشتنو شورای شارەکەشی رووخاند[221]. ئەوەی دەرفەتی بۆ رەخسا هەڵات لە زوڵمو دڵرەقی خەوارزمییەکان

لەوانەش (بەنو یەعلی) بوون کە لە دەوڵەمەندەکانی داقوق بوون، ماڵو حاڵیان تالأنکراو ناچار کۆچیانکرد بەرەو (شام)[٢٢٢]. سوڵتان (جەلالەددین) بۆ ماوەیەك لە (داقوق) مایەوەو جەورو ستەمی دەستدرێژی گەیشتە شارەکانی دەورووبەری، هێزێك لە خەوارزمییەکان بەرەو (بت)و[٢٢٣] (رازانات) ڕۆیشتنو دانیشتووانی بەرەو (تکریت) هەڵاتن[٢٢٤].

(موزەفەرەددین کۆکبری) میری (هەولێر) توانی سوڵتان (جەلالەددین) قایل بکا دوای ئەوەی پارەو دیاری بۆ نارد تا چاوی پڕ بکاو وڵاتی خەلیفە بەجێبهێڵێو نوێنەری بۆ لای خەلیفە بنێرێو گوێرایەڵی خۆی بنوێنێ تا ڕێزو حورمەتی لای سوڵتانەکانی دێ بمێنێو بەرەو (ئازەربێجان) بکەوێتە ڕێ کە (ئیبن بەهلول)ی دوژمنی لێیەو ئەویش قایل بوو[٢٢٥].

*** داگیرکردنی مەغۆلەکان بۆ داقوق:**

دەوڵەتی مەغۆلی لە ساڵی (٦٠١)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٠٤)ی زاینیی دەرکەوت لەسەر دەستی (جەنگیز خان) (سوڵتانی مەزن) لای تەتارەکانو باوکی پاشاکانیان[٢٢٦]، کە توانی هۆزەکانی مەغۆل کۆ بکاتو یەکیان بخات[٢٢٧]. هەوڵیدا دەسەڵاتی فراوان بکاو توانی باکووری (چین) داگیر بکاتو لە ساڵی (٦١٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢١٥)ی زاینیی بچێتە ناو (پەکین)ی پایتەختیو[٢٢٨] لە ڕۆژئاوا گەیشتە سنووری دەوڵەتی (خەوارزم)[٢٢٩].

لە ساڵی (٦١٧)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢١٩)ی زاینیی هێرشی مەغۆلەکان بۆ سەر وڵاتە ئیسلامییەکان دەستی پێکردو شارە ئیسلامییەکان یەك لە دوای یەك لەبەر هێرشی مەغۆلەکان ڕووخان، تاکو توانیان لە مانگی سەفەری ساڵی (٦٥٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٥٨)ی زاینیی) (بەغدا) داگیر بکەنو خەلیفە (ئەلموستەعسم باللە) دوا خەلیفەی عەباسی بکوژن[٢٣٠].

شاری داقوق نەهامەتیو کارەساتی زۆری بینی بە هۆی هێرشە یەك لە دوای یەکەکانی مەغۆل بۆ سەریان. لە ساڵی (٦١٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٢١)ی زاینیی (تەتەر) ەکان پەلاماری (داقوق)یان دا دوای ئەوەی (ئازەربێجان) یان داگیر کردو دوای دەستیان بەسەر (تەورێز) گرتو لەوێوە بەرەو هەولێر بەڕێکەوتن، بەڵام ڕێڕەویان گۆڕی بە هۆی سەختی ناوچەکەو ئاستەنگی لە ڕێگاکانیو لە هەندێ شوێنیدا تەنها سوارچاکێك لە دوای یەکتری دەیتوانی بڕوات[٢٣١]، بۆیە ڕوویان کردە (داقوق) کە بەشێك لە موڵکەکانی دەوڵەتی خەلافەت بوو، بۆیە خەلیفە نامەی نارد بۆ موسڵو بۆ (موزەفەرەددین) فەرمانڕەوای هەولێرو فەرمانی پێدان بەرەو داقوق بکەونە ڕێو لەگەڵ سوپاکەی کۆببنەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی تەتەرەکان، لە مانگی سەفەر (موزەفەرەددین) بەرەو داقوق کەوتە ڕێو بەشێك لە سوپای موسڵو گەیشتنە داقوقو خەلیفە هێزێکی بە سەرکردایەتی (جەمالەددین قوشتمر) کە گەورەترین میر بوو لە عێراقو لەگەڵ چەند میرێکی ترو (موزەفەرەددین کۆکبری) میری ئەربل سەرکردایەتی ئەم هێزەی دەکرد[٢٣٢]، بە هۆی کەمی ژمارەی سەربازەکانی (موزەفەرەددین) نەیتوانی ڕووبەڕووی تەتەرەکان ببێت، بۆیە داوای لە خەلیفە کرد دە هەزار سواری بۆ بنێرێ تا بتوانێ ڕووبەڕووی تەتەرەکان ببێتو خەلیفە بەڵێنیدا یارمەتی بۆ بنێرێ، بەڵام (موزەفەرەددین) سەرسام بوو بە کەمی ئەو سەربازانەی کە خەلیفە ناردبوی کە ژمارەیان لە هەشت سەد (تەواشی)[٢٣٣] تێناپەڕیو لەبەر ئەوە (موزەفەرەددین) بە باشی زانی هێرش نەکاو ژیانی سەربازەکانی نەخاتە مەترسی، کاتێ تەتەرەکان گوێیان لە کۆبونەوەی سوپای موسڵمانەکان بوو گەڕانەوە چونکە وایانزانی سوپای موسڵمانەکان بە شوێنیان کەوتوون، بەڵام کاتێ بینیان کەس شوێنیان نەکەوتووە بڵاوەیان لێ کردو گەڕانەوە وڵاتی خۆیان[٢٣٤].

لە ساڵی (٦٢٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٣٠)ی زاینیی[٢٣٥] جارێکی تر تەتەرەکان هێرشیان کردە سەر داقوق، لە (ئازربێجان)ەوە بەرەو هەولێرو دەورووبەریو کەوتنە کوشتنی ئەوانەی کەوتبونە سەر ڕێگایان لە تورکمانە (ئیوائییەکان)و[٢٣٦] کوردە (جورقانەکان)و[٢٣٧] خەڵکی تر تا چوونە ناو شاری هەولێرو دێهاتەکانیان تالأنکردو کرداری خراپو لە ڕادە بەدەریان کرد کە کەس پێشتر نەیبیستبوو[٢٣٨]، ئەوانەشیان کوشت تەنها خوا دەزانێ چەند بوون[٢٣٩].

(موزەفەرەددین) لە بەرامبەریان دەرچوو و داوای یارمەتیو هاوکاری لە سوپای (موسڵ)ی کردو ئەوانش بەهانای هاتن[٢٤٠]، هەروەها داوای هاوکاری لە خەلیفە کردو ئەویش سوپای ئامادەکرد لەژێر سەرکردایەتی (جەمالەددین قوشتمر)و لە نزیك (کەرخینی) یەکیان گرت[٢٤١]. بەڵام وادیارە بە یەککەیشتنی (موزەفەرەددین)و (جەمالەددین قوشتمر) دوای هێرشکردنی مەغۆلەکان بوو بۆ سەر (کەرخینی) و (داقوق)و کشانەوەیان بوو کە بە سەلامەتی گەڕانەوە بە بێ ئەوەی کەس بیانترسێنێ یا لە سەربازێك لە ڕوویان بوەستی[٢٤٢]، ژمارەیەکی زۆریان لە دانیشتووان کوشت[٢٤٣]. وادیارە مەغۆلەکان هەڵی کوشتنی سوڵتان (جەلالەددین منکبرتی) لە هەمان ساڵ قۆستەوە چونکە وەك کۆسپو بەربەستێك بوو لەبەردەم تەتەرەکان[٢٤٤].

لە ساڵی (٦٣٥)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٣٨)ی زاینیی تەتەرەکان جارێکی تر هێرشیان کردە سەر داقوق[٢٤٥]. ئەمەش بووە هۆی کۆچکردنی بەشێك لە دانیشتووانی بۆ بەغدا، وەك لە سەرچاوەکان هاتووە لە مانگی سەفەر هەواڵ هات کە مەغۆلەکان جارێکی تر گەڕانەوە بەرەو هەولێر بە ژمارەیەکی زۆر بۆیە خەڵکی شارەکەو قەڵاکەش هەولێریان بەجێهێشت، کاتێ میر (شەمسەددین باتکین) میری شارەکە ئەمەی بینی فەرمانی بە سەربازەکانی دا دەرچنە دەرەوی شارو خۆیان ئامادە بکەن بۆ پاراستنی شارەکە، بەڵام کە مەغۆلەکان ئەمیان بیست ڕێڕەویان گۆڕی بەرەو داقوقو کەوتنە ئەو شارو شارۆچکانەی سەر بە بەغدا بوو و دەستیان بە تێکدانو خراپەکاری کرد[٢٤٦] تا گەیشتنە (زەنگاباد)و[٢٤٧] (سامەڕا)[٢٤٨]، لەبەر ئەوە (موجاهیدەدین ئەلدویدار)و[٢٤٩] (شەرەفەددین ئیقبال ئەلشەرابی)[٢٥٠] دەرچوون بۆ بەرەنگاربوونەوەیان[٢٥١]، ووتاربێژی مزگەوتی

(قەسر) (ئەبا تاڵب ئەلموهتەدی) هانی خەڵکەکەی دەدا بۆ جیهادو خەڵکی بە دەنگی داواکەی چوون. بە هۆی ئەو کارەساتەی بەسەر خەڵکی داقوق هات زۆربەی خەڵکی شارەکەو دانیشتووانی داقوقو دەوروبەری ناوچەکەیان بەجێهێشتو روویان کردە بەغدا بۆ خۆپاراستنو ئەمەش بووە هۆی گرانبوونی نرخی کرێی خانوو. هەردوو هێز لە نزیکی چیا (چیای حەمرین) بە یەك گەیشتنو سوپای موسڵمانەکان بەسەر مەغۆلەکان سەرکەوتنو ژمارەیەکی زۆریان لێکوشتنو ژمارەیەکیش بەدیل گیران[252]. توانییان (١٥٠٠٠) دیل ئازاد بکەن کە مەغۆلەکان لە هەولێرو داقوق دیلیانی کردبوو[253]. پێدەچێت ژمارەی دیلەکان زیادەڕۆیی تێدا بێ چونکە ئەم ژمارە زۆرە لە دیلەکان دەبنە کۆسپێك لە جوڵە کردنی هێزی مەغۆلەکان کە خێراییو لە ناکاو هێرشبردنیان بەکار دەهێنا لە پەلامارەکانیان.

شاری داقوق حەوانەوەو ئیسراحەتی نەبینی بە هۆی ئەو هێرشو پەلامارە یەك بە دوای یەکانەی تەتەرەکانو ئەو کارەساتو نەهامەتییەی بەسەر شارەکەدا هاتبوو، لە ساڵی (٦٤٧)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٤٩)ی زایینیی مەغۆلەکان پەلاماری خانەقینو دەوروبەریان داو خەڵکێکی زۆریان کوشتو مەڕو ماڵاتێکی زۆریان تاڵان کردو بەرەو (رانگاو)[254] رۆیشتنو هەمان کاریان ئەنجامداو پاشان رۆیشتن بەرەو (بت)و (رازان)و لە ترسا دانیشتووانی (خاڵس)و رێگای (خوراسان) چوونە بەغدا، سوپا دەرچووە دەرەوەی شارو خۆیان ئامادەکرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن، (هەواڵپرس – سیخوڕ) بەرێکەوتن بۆ ئەوەی هەواڵی بارودۆخەکە بزاننو زانیاری کۆ بکەنەوە، هەواڵیان گێڕایەوە کە مەغۆلەکان گەڕاونەتەوەو چوونەتە (دەربەند)و زۆرێکیان لە خەڵکی داقوق کوشتووەو کۆمەڵێکیان بە دیل گرتووەو خراپەکارییان بە ئافرەتو منداڵەکان کردووە[255].

هەروەها داقوق یەکێك بوو لەو تەوەرانەی باڵای راستی سوپای مەغۆلەکان تێدا پێشڕەوییان کرد بەرەو بەغدا، لە شەوالی ساڵی (٦٥٥)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٢٥٧)ی زایینیی سوڵتانی مەغۆل (هۆلاکۆ) بریاری دا بەرەو بەغدا بکەوێتە رێ، هەر یەك لە (سوغانجق نوین)و (بایجونوین)ی نارد وەکو پێشەنگێك لە لای راستی سوپاوە لەسەر رێگای ئەربل بە چیاکانی شارەزوور وداقوق، و(کیت بوقا)و (ئەنکیا نوین) لە لای چەپ لە کریت[256]و (بەیات)و[257]، سوڵتان (هۆلاکۆ) لە ناوەڕاستی هێزەکەی بوو و لە رێگای (کرمان شاهان)و (حلوان)[258].

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. طه باقر واخرون، (تأريخ ايران القديم)، بغداد، ١٩٨٩، الصفحة (٧٩).

٢. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)، (مێژووی بڵاوبوونەوەی ئاینی مەسیحی لە ناوچەی کەرکوکدا)، چاپخانەی (شڤان)، سلێمانی، ٢٠٠٨، لاپەرەکانی (٣٧ – ٤٠).

٣. قوستەنتینی گەورە: قوستەنتینی کوری هیلانی یەکەم کەس بوو لە پاشا رۆمەکان کە هاتە سەر ئاینی مەسیحییەتو پایتەختی دەوڵەتی گواستەوە لە (رۆما) بۆ (قوستەنتینیە – ئەستەمبول)ی ئێستاو دەسەلاتی (٣٢) ساڵو (٣) مانگی خایاند، بڕوانە:
- المسعودي، (مروج الذهب ومعادن الجوهر)، بيروت، ٢٠٠٥، الجزء الاول، الصفحة (٢٨١).
- (التنبية والاشراف)، القاهرة، ١٩٣٨، الصفحة (١١٩).

٤. طه باقر، (تأريخ ايران القديم)، الصفحة (١٣١).

٥. بڕوانە: رفائيل بابو اسحاق، (تأريخ النصارى في العراق)، بغداد، ١٩٤٨، الصفحة (١٩).

٦. بڕوانە:
- بلاذري، (فتوح البلدان)، بيروت، ٢٠٠٠، الصفحة (١٦١).
- الطبري، (تأريخ الطبري)، لبنان، ٢٠٠٥، الجزء الثاني، الصفحة (٤٤٤).

٧. رازانات: دوو شارن نزیك بەغدا ژمارەییەکی زۆر لادێ لە خۆ دەگرێتو ئەبێتە دوو بەش (رازانی سەروو)و (رازانی خواروو)، بڕوانە:
- ياقوت، (معجم البلدان)، بيروت، المجلد الثاني، الجزء الثالث، الصفحات (٧١ – ٧٢).

هەردوو مێژوونووسی عێراقی (ئەحمەد سوسە)و (مستەفا جەواد) پێیان وایە (رازانات) دەکەوێتە ناوچەی عوزێمی ئێستا، (رازانی سەرەوە) دەکەوێتە رۆژئاوای رووباری (عوزێم)و (رازانی خوارەوە) دەکەوێتە رۆژهەڵاتی رووبارەکە، بەڵام (رۆژبەیانی) بۆچوونێکی جیاوازی هەیەو دەڵێ: (رێی پێ ناچێت هاشمی کوری عوتبە لە جەلەلاوە بروا بۆ داقوق، چونکە مانای نییە لە باشووری رۆژئاواوە بگەڕێتەوە بەرەو (غرفە)و رێگای راستو کورتی (جەلەولا – زەنداباد –کفری – دووزخورماتوو (خانیجار) – داقوق) بەجێبێڵێ لەو بڕوایەم کاتێ باسی (رازانات) دەکەن لە کتێبی (فتوح البلدان) مەبەست لادێو جێگای ترە نزیك داقوق).

لە کتێبی (کلدواشور)، لە لاپەرەکانی (٢)و (٣)، ئاشوورییەکان بە رووباری داقوقیان دەگووت (راندو)و بەو شارەی کە دەکەوێتە لای چەپی راذان)، بڕوانە:
- ملا جميل روزبياني، (داقوق دقوقاء في التأريخ)، الصفحات (٢٧٥ – ٢٧٦).
- صالح احمد العلي، (معالم العراق العمرانية)، بغداد، ١٩٨٩، الصفحات (٢٦٩ –٢٧٠).

٨. بڕوانە:

- بلاذري، (فتوح البلدان)، الصفحة (١٦١).
- فرست مرعي اسماعيل اسماعيل، (كردستان في القرن السابع الهجري)، السليمانية، ٢٠٠٦، الصفحة (١٣٣).
٩. بلاذري، (فتوح البلدان)، الصفحة (١٦١).
١٠. بڕوانە:
- واقدي، (فتوح الشام)، بيروت، ١٩٦٦، الجزء الثاني، الصفحة (٩٨).
- ابن خياط، (تأريخ خليفة ابن الخياط)، بيروت، ١٩٧٧، الجزء الاول، الصفحات (١٢٨ – ١٢٩).
١١. بڕوانە:
- الطبري، (تأريخ الطبري)، الجزء الثاني، الصفحة (٤٤٦).
- ابن الاثير، (الكامل في التأريخ)، بيروت، ١٩٦٣، الجزء الثاني، الصفحة (٣٤٨).
١٢. بڕوانە:
- عطا عبد الرحمن محي الدين، (حركات الخوارج في بلاد الكرد وما جاورها)، الصفحة (١٣٣).
- حكيم احمد مامند، (الكرد وبلادهم عند البلدانيين والرحالة المسلمين)، الصفحة (١٤٢).
١٣. طيرهان: شارێکە سەر بە موسڵەو دەکەوێتە نێوان تکریت و باجرمێ، بڕوانە:
- عبدالله بن عبد العزيز البكري، (معجم ما استعجم من اسماء البلاد والمواضع)، ضبط وتحقيق: مصطفى السقا، القاهرة، ١٩٤٥، الجزء السادس، الصفحة (٤٧٨).
- بە هەردوو کەناری ڕووباری دیجلە درێژ دەبێتەوە، دەکەوێتە نێوان هەردوو شاری (بەوازیج) لە باکوور تا (عەکبرا) لە باشوور، بڕوانە:
- توما المرجي، (كتاب الرؤساء)، الصفحة (١٣٢).
١٤. (فتوح البلدان)، الصفحة (٢٠٠).
١٥. بلاذري، نفس المصدر السابق، الصفحة (٢٠٠).
١٦. بڕوانە:
- الطبري، (تفسير الطبري)، الجزء السابع، بيروت، ٢٠٠١، الصفحة (١٢٥).
- الزرعي، (الطرق الحكيمة في السياسة الشرعية)، القاهرة، دون تأريخ، الجزء الاول، الصفحة (٢٦٧).
- وكيع، (اخبار القضاة)، الجزء الاول، القاهرة، ١٩٤٧، الصفحات (٢٨٦ –٢٨٧).
١٧. اشكيني، قادر محمد، (منطقة كركوك في العصر العباسي، بحوث الندوة العلمية حول كركوك ٢-٥ نيسان)، اربيل، ٢٠٠١، الصفحة (٢٣٠).
**١٨.** بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
- ادي شير، (تأريخ كلد واشور)، حلب، ٢٠٠٧، الجزء الثاني، الصفحة (٢٦٧).
- المطران اندراوس صنا، (تأريخ المسيحية في كركوك وباجرمي)، بغداد، ٢٠٠٦، الصفحة (٤٥).
١٩. (انساب الاشراف)، الجزء الثامن، الصفحة (٥٩).
٢٠. ساڵح کوڕی مەسرەح: لە خێڵی (ئیمرو ئەلقەیس کوڕی زیادە)و نازناوی (ئەبا مالیك) بووە. زۆر خوا پەرست بوو، دژی والی هەرێمی جەزیرە دەرچووەو چەندین شەڕ لەنێوانیاندا ڕوویدا، نزیك موسڵ لەسەر دەستی (ئەلحارس کوڕی عومەیرە ئەلهەمەدانی) کوژرا، بڕوانە:
- (انساب الاشراف، الجزء الثامن، الصفحة (٧).
-الزركلي، (الاعلام)، بيروت، ١٩٨٠، الجزء الثالث، الصفحة (٢٨٢).
٢١. بڕوانە:
- (تأريخ الموصل)، تحقيق: علي حبيبة، القاهرة، ١٩٨٦، الصفحة (٣٣).
- العمري، (منبه الأدباء في تأريخ الموصل الحدباء)، تحقيق، سعيد الديوجي، الموصل، ١٩٥٥، الصفحات (٣٣-٣٤).
- سعيد الديوجي، (تأريخ الموصل)، الجزء الاول، الموصل، ١٩٨٢، الصفحة (٤٥٦).
٢٢. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی خەوارج بڕوانە:
- البغدادي، (الفرق بين الفرق)، الصفحات (٤٩-٧٨).
٢٣. حسن ابراهيم حسن، (تأريخ الاسلام)، الجزء الاول، الصفحة (٣٠٧).
٢٤. بڕوانە:
- (معجم البلدان)، المجلد الثالث، الجزء الرابع، الصفحات (٣٠٣ – ٣٠٤).
- احسان عباس، (شعر الخوارج)، لبنان، ١٩٧٣، الصفحة (١٧٨).
٢٥. محەمەد کوڕی مەڕوان: محەمەد کوڕی مەڕوان کوڕی حەکەمی ئومەوی، والی هەرێمی جەزیرەو ئەرمینیا بوو لە ساڵی (٧٣)ی کۆچی، بە هێزو بە ئازایەتی بەناوبانگ بوو چەندین شەڕی لەگەڵ ڕۆمەکاندا کردووە، باوکی (مەروانی کوڕی محەمەد)ە کە دوا خەلیفەی ئومەوی بوو، بڕوانە:
- ابن الاثير، (الكامل)، الجزء الثالث، الصفحة (٤٠٩).
- الزركلي، (الاعلام)، الجزء السابع، الصفحة (٣١٥).
٢٦. (انساب الاشراف)، الجزء الثامن، الصفحة (٥٩).
٢٧. بڕوانە:
- ابن قتيبة، (المعارف)، حققه وعلق عليه: محمد اسماعيل عبدالله الصاوي، مصر، ١٩٣٤، الصفحة (١٨٠).
- (ابن كثير)، تحقيق: احمد جاد، الجزء التاسع، القاهرة، ٢٠٠٤، الصفحة (٣٠١).
٢٨. بڕوانە:
- اليعقوبي، (تأريخ اليعقوبي)، الجزء الثاني، الصفحة (١٩٢).
- ابن عبد ربه الاندلسي، احمد بن محمد الاندلسي، (العقد الفريد)، مصر، ١٩٣٥، الجزء الاول، الصفحة (٦٢).
٢٩. احمد ميرزا ميرزا، (غربي اقليم الجبال في صدر الاسلام)، الصفحة (١١٧).
٣٠. قەتقەتانە: شوێنێکە نزیك کوفە، ڕوو لە دەشتایی لە (تەف)، گرتوخانەی نوعمانی کوڕی مونزری تێدایە، بڕوانە:
- ياقوت، (معجم البلدان)، المجلد الرابع، الجزء السابع، الصفحة (٧٠).
- صالح احمد العلي، (معالم العراق العمرانية)، الصفحة (٦٩).
٣١. قەسر موقاتل: لەنێوان (عين التمر)و (شام)دایە نزیك

قەتقەتانە، دەگەڕێتەوە بۆ (موقاتل کوڕی حەسان کوڕی سەعلەبە کوڕی ئەوس)، بڕوانە:
– یاقوت، (معجم البلدان)، المجلد الرابع، الجزء السابع. الصفحة (٦٢).
– ابن الفقیە، (مختصر کتاب البلدان)، لیدن، ١٣٠٢، الصفحة (٢٨٣).
٣٢. ئەلحەساسە: لە دێهاتەکانی ڕەشەخاکە نزیك کۆشکی (ئیبن هوبەیرە)، سەر بە کوفەیە، بڕوانە:
– یاقوت، (معجم البلدان)، المجلد الثاني، الجزء الثالث، الصفحة (١٣١).
٣٣. بڕوانە:
– بلاذري، (انساب الاشراف)، حققه وقدم له: سهیل زکار واخرون، الجزء الثامن، بیروت، دون تأریخ، الصفحة (٢٢).
– ابن ابي الحدید، (تحقیق محمد ابو الفضل)، المجلد الثاني، الجزء الرابع، بیروت، ٢٠٠٨، الصفحة (٤٢٩).
– الطبري، (تأریخ الطبري)، الجزء الرابع، الصفحة (٢٠٤).
– ابن الاثیر، (الکامل)، الجزء الثاني، الصفحة (٤٤٥).
– نویري، (نهایة الارب)، المجلد العاشر، الجزء الحادي والعشرون، الصفحة (١٠٦).
٣٤. بڕوانە:
– ابن ابي الحدید، نفس المصدر السابق، المجلد الثاني، الجزء الرابع، الصفحة (٤٤٦).
– الطبري: نفس المصدر السابق، الجزء الرابع، (٢٠٤).
٣٥. ماوەی نێوان داقوق‌و خانیجار (خورماتوو) نزیکەی (٣٧) کم بووە، بڕوانە:
– نەقشبەندی، (کورد لە دەینەوەر وشارەزوور)، لاپەڕە (٤٦).
٣٦. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
– عطا عبدالرحمن محي الدین، (حرکات الخوارج في بلاد الکرد وما جاورها)، الصفحات (٢٤٢ – ٢٥٤).
٣٧. بڕوانە:
– الطبري: (تأریخ الطبري)، الجزء الرابع، الصفحة (٢١٠).
– ابن ابي الحدید، (شرح نهج البلاغة)، المجلد الثاني، الجزء الرابع، الصفحة (٤٤٧).
– ابن الاثیر، (الکامل)، الجزء الثالث، الصفحة (٤٥٠).
– ابن خلدون، (العبر)، الجزء الثالث، الصفحة (١٦١).
– نویري، (نهایة الارب)، المجلد العاشر، الجزء الحادي والعشرون، الصفحة (١١٠).
٣٨. فائزة محمد عزت، (الکرد في اقلیم الجزیرة وشهرزور في صدر الاسلام)، الصفحة (١١٢).
٣٩. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
– نوري جعفر: (الصراع بین الامویین ومبادئ الاسلام)، بغداد، ١٩٥٦، الصفحات (٩٦ – ١١٢).
٤٠. (العبر)، الجزء الاول، الصفحة (١٤٩).
٤١. بڕوانە:
– مبرد، (الکامل في اللغة والأدب)، الجزء الثاني، الصفحة (٧٨).
– ابن عبد ربه الاندلسي، (العقد الفرید)، الجزء الاول، الصفحة (٢٧٢).
– محمد بدیع عارف، (الصراع بین الموالی والعرب)، الصفحة (٤١).
– رشید الخیون، (الادیان والمذاهب بالعراق)، الصفحات (١٦٩–١٧٠).
٤٢. یولیوس فلهاوزن، (الخوارج والشیعة)، ترجمة: عبد الرحمن بدوي)، کویت، ١٩٧٨، الصفحة (٩١).
٤٣. (تأریخ الشعوب الاسلامیة)، لبنان، ٢٠٠٠، الصفحة (١٤٤).
٤٤. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
– سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)، (مێژووی بڵاوبونەوەی ئاینی مەسیحی لە کەرکوکدا)، سلێمانی، ٢٠٠٥.
– اندراوس صنا، (تأریخ المسیحیة في کرکوك وباجرمي)، بغداد، ٢٠٠٦.
٤٥. ئەبو ئەلسەرایا ئەلسری: لە خێڵی (زەهل کوڕی شەیبان) ە، لە سەرەتای خەلافەتی (مەئمون) یاخیبوونی خۆی ڕاگەیاند لە کوفەو گفت‌و بەیعەتی دا بە (محەمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئیسماعیل) کە ناسراوە بە (ئیبن تەباتەبا)، لە ساڵی (١٩٩)ی کۆچی هەموو ئەو لەشکرانەی بەزاند کە (حەسەن کوڕی سوهەیل) دژی ناردبووی تاکو بەدیل گیرا. بە دەستی (حەسەن کوڕی سوهەیل) کوژرا لە ساڵی (٢٠٠) ی کۆچی، بڕوانە:
– الصفدي، صلاح الدین خلیل بن ایبك، (الوافي بالوفیات)، الجزء الخامس، فیسبادن، ١٩٨٢، الصفحة (٣٨).
٤٦. هرسمە کوڕی ئەعیون: یەکێك بوو لە میرو سەرکردە ئازاو لێهاتووکان، لە ساڵی (١٧٨)ی کۆچی خەلیفە (ڕەشید) ی عەباسی کردیە والی میسر دواتر ناردی بۆ ئەفریقیا بۆ ملکەچکردنی یاخیبوان‌و لە ساڵی (١٧٩)ی کۆچی چوونە ناو (قەیرەوان)و خێڵە بەربەرەکان گوێڕایەڵیان نوواند. پشتگیری (مەئمون)ی کرد لە شەڕی دژی (ئەمین)و سەرکردایەتی لەشکرەکەی دەکردو دڵسۆزی نوواند لە کارەکەیدا تا ئاژاوەکە دانەمرکا، بە کوشتنی (ئەمین) پاشان (مەئمون) گرتی‌و خستییە زیندان‌و لەوێ لە ساڵی (٢٠٠)ی کۆچی کوژرا، بڕوانە:
– الطبري، (تأریخ الطبري)، الجزء الخامس، الصفحات (٣٩٥ – ٤٣١).
– الطبري، (تأریخ الطبري)، الجزء السادس، الصفحات (١٩ – ٧٤).
– زرکلي، (الاعلام)، الجزء التاسع، الصفحات (٧٥–٧٦).
٤٧. بڕوانە:
– ابن الاثیر، (الکامل)، الجزء الخامس، الصفحة (٤٦٥).
– النویري، (نهایة الارب)، المجلد العاشر، الجزء الثاني والعشرون، الصفحة (١٣٦).
٤٨. بەدر ئەلشەرابی: خزمەتکاری (ئەبی ئەلحەسەن کوڕی محەمەد – ئیبن ئەلفورت) بووە، کرا بە میری ڕۆژهەڵاتی بەغدا دوای لەسەرکار لابردنی (محەمەد کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی تاهیر)، بڕوانە:
– قرطبي، (صلة تأریخ الطبري)، الجزء الثاني، الصفحة (٣٢).

لەساڵی (٣١٥)ی كۆچی، كۆچی دوایی كرد، بڕوانە:
– ابن الجوزي، (المنتظم في تأريخ الأمم والملوك)، حيدر اباد، الجزء السادس، ١٣٥٨ هجري، الصفحة (٢١٠).
٤٩. ناوەندییەكان: بەشێك بوون لە سوپا، لە سەردەمی خەلیفە (ئەلموعتەزید باللە) سەربازەكان تاقیدەكران لەسەر سوارچاكی و هاویشتن و بە پێی ئەنجامەكانی تاقیكردنەوەكە ئەكران بە سێ بەش، یەكەم پلەی (باش) پێ ئەدراو بە (ج) ئاماژەی بۆ دەكراو بە سەربازی تایبەت ناودەبران، دووەم پلەی (ناوەند) و بە (ط) ئاماژەیان بۆ دەكراو پلەیان لە ئاستی یەكەم كەمتر بوو، سێیەم (خراپەكان) و بە (د) ئاماژەیان بۆ دەكرا كە لە سوارچاكی و هاویشتن باش نەبوون، بڕوانە:
– صابي، (تحفة الامراء في تأريخ الوزراء)، بغداد، ١٩٤٨، الصفحات (١٧–١٨).
٥٠. ئەنبار، (ڕۆژبەیانی) دەڵێ: وەك لە ڕێگاكە دەرەكەوێ ئەنبار لێرەدا شاری ئەنبار (فیروز سابور)ی كۆن نییە، بەڵكو شوێنێكی ترە دەكەوێتە سەر ئەو ڕێگایە كە لە (خوراسان) ەوە بەرەو عێراق دێ و واباوەڕ دەكرێ لە شوێنی قەرەتەپەی ئێستا بێ، بڕوانە:
– (داقوق "دقوقا" في التأريخ)، الصفحة (٣٨٢).
ئەو ڕایەی ڕۆژبەیانی زۆر لە ڕاستی نزیكە چونكە ووشەی (ئەنبار) بەمانای (ماڵی بازرگان – بيت التاجر) دێ كە كاڵاكانیان تێدا كۆدەكرێتەوە، بڕوانە:
– فيروز ابادي، (القاموس المحيط)، الصفحة (١٢٥٦).
(بەكری) دەڵێ: جێگایەكە بۆ كۆكردنەوەی ئازوقە لە شێوەی خان یاخود ناوەندی بازرگانی لەسەر ڕێگای هاتوچۆ، بڕوانە:
– (معجم ما استعجم)، الجزء الاول، الصفحة (١٩٧).
٥١. (تحفة الامراء)، الصفحات (١٧–١٨).
٥٢. عەكبەرا: شارۆچكەیەكە سەر بە ناحیەی (دوجێل)ە، دووری لە بەغدا (١٠) فەرسەخە، بڕوانە:
– ياقوت، (معجم البلدان)، المجلد الثالث، الجزء السادس، الصفحة (٣٤٢).
٥٣. (الكامل)، الجزء السادس، الصفحة (٦٦٨).
٥٤. تەحریر ئەلسەغیر: لە ساڵی (٣٠١)ی كۆچی كرا بە والی موسڵ و لە ساڵی (٣٠٤)ی كۆچی كرا بە والی هەرێمی چیا، بڕوانە:
– ابن الاثير، (الكامل)، الجزء السادس، الصفحات (٦٢٤ – ٦٤٧).
٥٥. ابن الاثير، (الكامل)، الجزء السادس، الصفحات (٧٤٧ – ٧٤٨).
٥٦. صولي، ابي بكر محمد بن يحيى، (اخبار الراضي بالله والمتقي لله)، القاهرة، ١٩٣٤ – ١٩٣٥، الصفحة (٧١).
٥٧. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
– الدوري، تقي الدين عارف، (عصر امرة الامراء في العراق)، بغداد، ١٩٧٥، الصفحات (٥٦–٦٦).
– فاروق عمر، (الخلافة العباسية في عصر الفوضى العسكرية)، بغداد، ١٩٧٣، الصفحات (٦٩. ٧٧).
٥٨. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
– بغدادي، (الفرق بين الفرق)، لبنان، ٢٠٠٥، الصفحات (٢١٣–٢٢١).
٥٩. ابن الاثير، (الكامل)، الجزء السادس، الصفحات (٥٥١ . ٥٥٢).
٦٠. الطبري، (تأريخ الطبري)، الجزء السادس، الصفحات (٥٣٨. ٥٣٩).
٦١. بڕوانە:
– ابن حزم، (جمهرة انساب العرب)، الصفحة (١٩٦).
– قلقشندي، (نهاية الارب في معرفة انساب العرب)، عني بنشره وتحقيقه والتعليق عليه: علي الخاقاني، بغداد، ١٩٥٨، الصفحة (٢٢٣).
٦٢. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی دەوڵەتی حەمدانی بڕوانە:
– ديوجي، (تأريخ الموصل)، الجزء الاول، الصفحات (٨٦ – ١٤٨).
– روضان، عبد عون، (موسوعة تأريخ العرب)، عمان، ٢٠٠٤، الصفحات (٦٠٩ – ٦٢٠).
– رشيد عبد الله الجميلي، (الموصل في عهد الادارة الحمدانية، موسوعة الموصل الحضارية)، المجلد الثاني، الموصل، ١٩٩٢، الصفحات (٩٢ – ١٠١).
٦٣. ابن الاثير، (الكامل)، الجزء السادس، الصفحة (٥٤٧).
٦٤. ابن الاثير، نفس المصدر السابق، الجزء السادس، الصفحة (٦٢٤).
٦٥. ابن الاثير، نفس المصدر السابق، الجزء السادس، الصفحات (٧٠٤ – ٧٠٥).
٦٦. جاسم محمد خلف، (محاضرات في جغرافية العراق)، بغداد، ١٩٧٣، الصفحة (٦٩).
٦٧. بڕوانە: ابن حوقل، (صورة الارض)، كە لە نەخشەی كتێبەكەدا ئاماژەی پێ كراوە.
٦٨. بڕوانە:
– الطبري، (تأريخ الطبري)، الجزء الرابع، الصفحة (٢١٠).
– ابن الاثير، (الكامل)، الجزء الثالث، الصفحة (٤٥٠).
– ابن خلدون، (العبر)، الجزء الثالث، الصفحة (١٦١).
٦٩. الصابي، (تحفة الوزراء)، الصفحات (١٧ – ١٨).
٧٠. بڕوانە:
– فائزة محمد عزت، (الكرد في اقليم الجزيرة وشهرزور في صدر الاسلام)، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، اربيل، ١٩٩١، الصفحة (٣٨).
– زرار صديق توفيق، (القبائل والزعامات القبلية في العصر الوسيط)، اربيل، ٢٠٠٧، الصفحات (١٣١ – ١٣٢).
٧١. ابن الاثير: (الكامل)، الجزء السادس، الصفحة (٧٣٨).
٧٢. ابن الاثير، نفس المصدر السابق، الجزء السادس، الصفحة (٧٣٦).
٧٣. مسكويه، (تجارب الأمم)، الجزء الثاني، الصفحة (١٠٨).
٧٤. بەختیار، ئەبو مەنسور، نازناوی (عیزولدەولە) بوو دوای مردنی باوكی (موعیزولدەولە) دەسەڵاتی گرتە دەست، پاشایەكی بە هێز توندو تیژ بوو، ململانێی توندی لەگەڵ (عیزولدەولە)ی كوڕی مامی هەبوو لەسەر فراوانكردنی دەسەڵاتیان بەسەر ناوچەكان بوو بە هۆی تێكچوونی پەیوەندی لەنێوانیان تا لە ساڵی (٣٦٧)ی كۆچی

بە یەکگەیشتن و بە کوشتنی (عیزولدەولە) کە تەمەنی (٣٦) ساڵ بوو ئەم ململانێیە کۆتایی پێهات، بڕوانە:
– ابن خلکان، (وفیات الاعیان)، الجزء الاول، الصفحة (١٤٠).
٧٥. ابن الاثیر، (الکامل)، الجزء السابع، الصفحة (٣٦٠).
٧٦. دەیلەم: بەشێکی شاخاویە لە ناوچەی (جیلان) سنووری لە باشوورەوە (قەزوین)ی (ئازەربێجانە) و بەشێك لە شاری (رەی) لە رۆژهەڵات پارچەیەك لە (رەی) و (تەبرستان) و لە باکوورەوە دەریای (خەزەر) و لە خۆرئاواوە بەشێك لە (ئازەربێجان) و وڵاتی (ران)، دەیلەم (دار کفر – بێباوەڕ) بوون دیلکانیان کۆیلەدەکران تا هاتنی (ئەلحەسەن کوڕی زەید ئەلعەلوی) لە ساڵی (٢٥٠)ی کۆچی بۆ ناویان و بەشێکیان لەسەر دەستی موسڵمان بوون، لە چیا سەختەکاندا خۆیان قایم کردبوو، ئەو چیایەی پاشای تێدابوو پێی دەوترا (تەرەم) و بنکەی بنەماڵی (جەستان) و سەرۆکایەتی دەیلەمی لێ بوو، پیشەیان جوتیاری و بە بەخێوکردنی مەڕو ماڵاتەوە بوو، بڕوانە:
– ابن حوقل، (صورة الارض)، الصفحات (٣١٨ – ٣٢٠).
– ابو الفداء، (تقویم البلدان)، الصفحة (٧١).
٧٧. بڕوانە:
– مسکویه، (تجارب الأمم)، الجزء الاول، الصفحة (٨٥).
– ابن الاثیر، (الکامل)، الجزء السابع، الصفحة (٥).
– ابن خلدون، (العبر)، الجزء الثالث، الصفحة (٣٩٣).
٧٨. صابي، (المنتزع من کتاب التاجي)، تحقیق وشرح: محمد حسین الزبیدي، بغداد، ١٩٧٧، ل(٤١).
٧٩. فارس: هەرێمێکی گەورەیە پان و بەرینە، دەکەوێتە نێوان عێراق و کرمان و دەریای هیند و وڵاتی سند، بڕوانە:
– یاقوت الحموي، (معجم البلدان)، المجلد الثاني، الجزء السادس، الصفحة (٤٠٧).
٨٠. بڕوانە:
– مسکویه، (تجارب الأمم)، الجزء الاول، الصفحات (٣٩٩ – ٣٠٠).
– الصولي، (اخبار الراضي والمتقي لله)، الصفحة (٢٣٦).
٨١. بڕوانە:
– مسکویه، نفس المصدر السابق، الجزء الثاني، الصفحة (٨٥).
– فاروق عمر، (الخلافة العباسیة في عصر الفوضی العسکریة)، الصفحة (٧٨).
٨٢. بڕوانە:
– ابن الاثیر، (الکامل)، الجزء الثامن، الصفحة (١٢٨).
– محمد احمد سعد، (موسوعة التأریخ الهجري)، عمان، ٢٠٠٢، الصفحة (٢٤٠).
– بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی دەوڵەتی بوەیهی بڕوانە:
– عبد العزیز الدوري، (دراسات في العصور العباسیة المتاخرة)، بغداد، ١٩٤٥، الصفحات (٢٣٧ – ٢٩٠).
٨٣. ابن الاثیر، (الکامل)، الجزء السابع، الصفحة (٣٦٠).
٨٤. مسکویه، (تجارب الأمم)، الجزء الثاني، الصفحات (٣٩٨ – ٣٩٩).
٨٥. ابن الاثیر، (الکامل)، الجزء السابع، الصفحة (٤٩٤).
٨٦. (عەمید ئەلجیوش)، میرو وەزیر، ئەبو عەلی (ئەلحەسەن کوڕی ئەبو جەعفەر) لە ساڵی (٣٥٠)ی کۆچی لەدایکبووە، میر (جەعفەر)ی باوکی پەردەدارو خزمەتکاری میر (ئەبو عەلی بەهائولدەولە) بوو، (بەهائولدەولە) وەك جێگری خۆی ناردی بۆ عێراق لە ساڵی (٣٩٢)ی کۆچی کە ئاژاوەو فیتنەی تێدا هەڵگیرسابوو، توانی بە زیرەکی کاروباری عێراق ڕێکبخا و دزو جەردە لەناو ببات، ماتەمینی (عاشورا)ی هەڵوەشاندەوە، لە ساڵی (٤٠١)ی کۆچی، کۆچی دوایی کرد، بڕوانە:
– ابن الجوزي، (المنتظم)، الجزء السابع، الصفحات (٢٥٢–٢٥٣).
٨٧. فەخرولمەلیك ئەبو غالب، ئەبو غالب محەمەد کوڕی عەلی کوڕی خەلەف، باوکی بەرپرسی دیوانی خەزینەی شاری (واسط) بوو، لە تەمەنی گەنجی نازناوی (وەزیری بچووك)ی پێ دەوترا، چەندین پلەو پۆستی پێ سپێردرا تاکو بوو بە بەرپرسی دیوانی (واسط)، پاشان بوو بە وەزیرو هەروەها بوو بە جێگری (بهائولدەولە) لە فارس، توانی دەست بەسەر چەندین قەڵا بگرێ، دوای مردنی (عەمید ئەلجیوش) جێی گرت لە بەڕێوەبردنی عێراق، لە خودان و ماتەمینی (عاشورا)ی گەڕاندەوەو بووە هۆی سەرهەڵدانی فیتنەو ئاژاوەو لە ئەنجامدا بووە کوشتنی لە ساڵی (٤٠٧)ی کۆچی، بڕوانە:
– الذهبي، (سیر اعلام النبلاء)، اعتنی بە محمد بن عیاد بن عبدالحمید، الجزء الأول، القاهرة، ٢٠٠٣، الصفحة (٤٥٥).
٨٨. ابن الاثیر، (الکامل)، الجزء السابع، الصفحة (٥٧٣).
٨٩. ابن الاثیر: نفس المصدر السابق، الجزء السابع، الصفحات (٥٧٤ – ٥٨٤).
٩٠. بڕوانە:
– ابن الفوطي، (تلخیص مجمع الاداب)، الجزء الرابع، القسم الثالث، الصفحة (١١).
– الروزبیاني، (داقوق "دقوقاء" في التأریخ)، الصفحات (٣٨٨ – ٣٨٩).
٩١. بڕوانە:
– ابن الاثیر، (الکامل)، الجزء السابع، الصفحة (٤٩٤).
– ابن خلدون، (العبر)، الجزء الرابع، الصفحات (٢٦٠ – ٢٦١).
٩٢. ئەلبەتیحە: ناوەڕۆیەکی فراوانەو کۆیەکەی (بەتائیحە) زەوییەکی فراوان بوو لەنێوان (واسط) و (بەسرە) لە کۆندا هەمووی لادێی بەیەکگەیشتبوو و زەوییەکی ئاوەدان بوو و لە رۆژگاری کیسرا (ئەپرەوین) بە هۆی لافاوی دیجلەو فورات و زیادبوونی ڕێژەی ئاوەکە بەنداوەکە بەرینەگرت و دادەتەپا، ئاوەکە بڵاوبۆوەو ڕووبەرێکی فراوانی لەو ناوچەیەی گرتەوە، بڕوانە:
– یاقوت، (معجم البلدان)، المجلد الاول، الجزء الثاني، الصفحات (٣٥٥ – ٣٥٦).
٩٣. ابن الاثیر، (الکامل)، الجزء السابع، الصفحات (٤٩٣ – ٤٩٤).
٩٤. ابن العبري، ابو الفرج جمال الدین غریغوریوس الملطي، (تاریخ الزمان)، بیروت، ١٩٩١، الصفحة (٧١).

٩٥. ابن الاثیر، (الكامل)، الجزء السابع، الصفحة (٤٩٤).
٩٦. بڕوانە:
– (كتاب التأريخ)، اعتنى بتصحيحه: هـ. ف امدروز و مرحليوت، الجزء الثامن، الصفحة (٣٧٢).
– ڕۆژبەیانی، (مێژووی حەسنەویی و عەیاری)، لاپەڕە (١٩١).
– خليل ابراهيم السامرائي، (تأريخ الدولة العربية الاسلامية في العصر العباسي)، الموصل، ١٩٨٨، الصفحة (١٩٥).
٩٧. لای (ئیبن خەلدون) بە (موشەك كوڕی جكويه) هاتووە، بڕوانە:
– (العبر)، الجزء الرابع، الصفحة (٢٦٠).
٩٨. زرار صديق توفيق، (القبائل والزعامات القبلية الكردية في العصر الوسيط)، الصفحه (١٧٥).
٩٩. بڕوانە:
– ابن الاثیر، (الكامل)، الجزء السابع، الصفحة (٤٩٤).
– ابن خلدون، (العبر)، الجزء الرابع، الصفحات (٢٦٠ – ٢٦١).
١٠٠. بڕوانە:
– ابن خلكان، (وفيات الاعيان)، الجزء الثالث، الصفحة (١٣٢).
– ابن خلدون، نفس المصدر السابق، الجزء الرابع، الصفحة (٢٥٨).
١٠١. نسێبین: یەكێكە لە شارەكانی هەرێمی جەزیرە لەسەر ڕێگای كاروانە بازرگانییەكانی نێوان موسڵ و وڵاتی شام و دووری لەگەڵ سنجار (٩) فەرسەخە و لە موسڵ (٦) ڕۆژ دوورە. لەسەر دەستی (عیاز كوڕی غەنەم) فەتح كراو باغ و بێستان و بەروبوومی كشتوكاڵی زۆرە، بڕوانە:
– القزويني، ابو زكريا محمد بن محمود، (اثار البلاد واخبار العباد)، بيروت، ١٩٦٠، الصفحة (٤٦٧).
– ياقوت، (معجم البلدان)، المجلد الرابع، الجزء الثامن، الصفحة (٣٩٠).
١٠٢. بڕوانە:
– الروذراوري، ابو شجاع محمد بن حسين، (ذيل تجارب الأمم)، الجزء الثالث، ميسر، ١٩٦١، الصفحة (١٧٩).
– ابن الاثیر، (الكامل)، الجزء السابع، الصفحة (٤٣٨).
– ابن خلدون، (العبر)، الجزء الرابع، الصفحة (٢٥٨).
١٠٣. بڕوانە:
– ابن الاثیر، نفس المصدر السابق، الجزء الثامن، الصفحات (٤٠٢– ٤٠٣).
بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی دەوڵەتی عەقیلی بڕوانە:
– خاشع المعاضيدي، (الموصل في عهد الادارة العقيلية، موسوعة الموصل الحضارية)، الجزء الثاني، الصفحات (١٠٢ – ١١٩).
١٠٤. بڕوانە:
– ابن الاثیر، نفس المصدر السابق، الجزء السابع، الصفحات (٤٩٢ – ٤٩٤).
– ابن خلدون، (العبر)، الجزء الرابع، الصفحة (٢٦٠).
١٠٥. عەلی كوڕی مەزید ئەلئەسەدی: یەكەم میری مەزیدییەكان بوو لە (حیللە) لە ساڵی (٣٩٧)ی كۆچی، نازناوی (سەنەد ئەلدەولە)ی پێ بەخشرا، پیاوێكی ئازا بوو، بە شەڕەكانی دژی خێڵی (دوبەیس) ناوبانگی دەركرد، میر (فەخرولدەولە)ی بوەیهی لە ساڵی (٤٠٥)ی كۆچی دەسەڵاتی ناوچەی (جزیرەی دوبەیسیە)ی پێ بەخشی، دەسەڵاتی تەنها ناوچەی (حیللە)ی لە خۆ گرتبوو، لە ساڵی (٤٠٩)ی كۆچی لەوێ كۆچی دوایكرد، بڕوانە:
– ابن الجوزي، (المنتظم)، الجزء السابع، الصفحات (٢٣٤، ٢٦١، ٢٧٠، ٢٨٩).
– الزركلي، (الاعلام)، الجزء الخامس، الصفحات (١٧٣).
١٠٦. بڕوانە:
– ابن الاثیر، (الكامل)، الجزء السابع، الصفحة (٤٩٣).
– الديوجي، (تأريخ الموصل)، الجزء الاول، الصفحات (١٥٤ – ١٥٥).
١٠٧. ابن الفوطي، (تلخيص مجمع الاداب)، الجزء الرابع، القسم الثالث، الصفحة (١١).
١٠٨. بەدران كوڕی ئەلموقەلید: یەكێكە لە میرەكانی بنەماڵەی عەقیلییەكان بوو، لە ساڵی (٤١٩)ی كۆچی دەستی بەسەر شاری (نسێبین)دا گرت كە موڵكی (نەسرولدەولە كوڕی مەروان) بوو، چەندین شەڕ لەنێوانیاندا ڕوویدا تاكو میر (بەدران) لە نسێبین جێگیر بوو دوای ڕێككەوتن لەگەڵ میر (نەسرولدەولە) تاكو لە ساڵی (٤٢٥)ی كۆچی، كۆچی دوایی كرد، بڕوانە:
– ابن الاثیر، (الكامل)، الجزء السابع، الصفحات (٧٠٥، ٧٣٠، ٧٥٦).
– الزركلي، (الاعلام)، الجزء الثاني، الصفحة (١٣).
١٠٩. ابن الاثیر، نفس المصدر السابق، الجزء السابع، الصفحة (٤٩٤).
١١٠. بڕوانە:
– ابن الاثیر، نفس المصدر السابق، الجزء السابع، الصفحة (٧٣٠).
– ابن خلدون، (العبر)، الجزء الرابع، الصفحة (٢٦١).
١١١. بڕوانە:
– ابن الاثیر، نفس المصدر السابق، الجزء السابع، الصفحة (٧٣١).
– ابن خلدون: نفس المصدر السابق، الجزء الرابع، الصفحة (٢٦٥).
١١٢. حەلوان: شارێكە دەكەوێتە كۆتایی سنووری ویلایەتی عێراقی عەرەبی و سەرەتای هەرێمی چیا، شارێكە لە خاكی عێراق تەنها كوفە و بەسرە و واست و بەغدا لەو گەورەترو بە پیتترن، بڕوانە:
– ابن حوقل، (صورة الارض)، الصفحة (٢٢).
– الزمخشري، جارالله ابي القاسم محمود بن عمر، (الامكنة والمياة والجبال)، بغداد، ١٩٦٨، الصفحة (٧٦).
١١٣. بڕوانە:
– ابن خلدون، (العبر)، الجزء الرابع، الصفحة (٥٨١).
– بەدلیسی، (شەرەفنامە)، لاپەڕە (٥٦).
١١٤. بڕوانە:

- مسعودي، (التنبية والاشراف)، الصفحة (٧٨).
- مروج الذهب، الجزء الثاني، الصفحة (١٠٨).

١١٥. بڕوانە:
- نقشبندي، (الكرد في الدينور وشهرزور)، الصفحة (١٩٥).
- فرست مرعي اسماعيل، (الامارات الكردية في العهد العباسي الثاني)، دهوك، ٢٠٠٥، الصفحة (٢٣٧).

١١٦. بڕوانە:
- ابن خلدون، (العبر)، الجزء الرابع، الصفحة (٥١٨).
- بەدلیسی، (شەرەفنامە)، لاپەڕە (٥٦).
- زامباور، (معجم الانساب والاسرات الحاكمة في التأريخ الاسلامي)، القاهرة، ١٩٥١، الجزء الثاني، الصفحة (٣١٢).
- النقشبندي، نفس المصدر السابق، الصفحة (١٩٦).

١١٧. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
- زامباور، (معجم الانساب والاسرات الحاكمة في التأريخ الاسلامي)، الجزء الثاني، الصفحة (٣٢١).
- قادر محمد حسن، (الامارات الكردية في العهد البويهي)، الصفحات (٣٨-٤١).
- فرست مرعي اسماعيل، (الامارات الكردية في العهد العباسي الثاني)، الصفحة (٣٤١).

١١٨. بڕوانە:
- ابن الأثير، (الكامل)، الجزء الثامن، الصفحة (٥٤٧).
- بەدلیسی، (شەرەفنامە)، لاپەڕە (٦١).

١١٩. بڕوانە:
- قادر محمد حسن، (الامارات الكردية في العهد البويهي)، الصفحة (٤١).
- فرست مرعي اسماعيل، (الامارات الكردية في العهد العباسي الثاني)، الصفحات (٣٣١. ٤٢٢).

١٢٠. (الكامل)، الجزء السابع، الصفحة (٤٩٤).

١٢١. بڕوانە:
- ابن الأثير، نفس المصدر السابق، الجزء السابع، الصفحة (٥١٩).
- ابن خلدون، (العبر)، الجزء الرابع، الصفحة (٢٦١).

١٢٢. بڕوانە:
- ابن الأثير، نفس المصدر السابق، الجزء السابع، الصفحة (٤٩٤).
- ابن خلدون: نفس المصدر السابق، الجزء الرابع، الصفحة (٢٦٠).

١٢٣. بڕوانە:
- ابن الأثير، نفس المصدر السابق، الجزء السابع، الصفحة (٧٣١).
- ابن خلدون: نفس المصدر السابق، الجزء الرابع، الصفحة (٢٦٥).

١٢٤. ابن الاثير، نفس المصدر السابق، الجزء السابع، الصفحة (٧٩٥).

١٢٥. سەعدی: میر سەعدی کوڕی ئەبی ئەلشەوك فارس، لە سەردەمی باوکی میری (بەندنیجین – مەندەلی) بوو، هاوکاری (ئیبراهیم یەنال)ی کرد دژی میر (موهەلهەل)ی مامی و دەستی بەسەر (حەلوان) گرت، لە ساڵی (٤٣٨)ی کۆچی میر (سەرخاب)ی مامی گرتی، لە ساڵی (٤٤٤)ی کۆچی بوو بە میری میرنشینی (عەنازی)، ماوەی فەرمانڕەوایی دوو ساڵی نەخایاند، بڕوانە:
- بەدلیسی، (شەرەفنامە)، لاپەڕە (٥٩ – ٦٠).

١٢٦. سەرخاب: میر سەرخاب کوڕی ئەبوئەلفەتح محەمەد، هەلی سەرقاڵی شەڕی (ئەبو ئەلشەوك)ی برای لەگەڵ (عەلائولدەولە)ی قۆستەوەو دەستی گرت بەسەر داقوق و (بەندنیجین)و شاری تر، لە ساڵی (٤٣٩)ی کۆچی کوردە لوڕەکان و کۆمەڵی سەربازی خۆی دەست بەسەریان کرد بە هۆی خراپی هەڵسوکەوتی لەگەڵیان و رادەستی (ئیبراهیم یەنال)یان کرد ئەویش چاوێکی دەرهێنا، لە ساڵی (٤٤٢)ی کۆچی (توغرلبەگ) لە زیندان ئازادیکرد پاش ئەوەی (موهەلهەل)ی برای شەفاعەتی بۆ خواست و دابڕین و بەخشینی قەڵای (ماهکی) بۆ سەرخاب، بڕوانە:
- ابن الاثير، (الكامل)، الجزء الثامن، الصفحة (٦٠).
- بەدلیسی، هەمان سەرچاوەچی پێشوو، لاپەڕە (٥٨).
- زكي بك، (مشاهير الكرد وكردستان)، إعداد رفيق صالح، السليمانية، ٢٠٠٥، الصفحة (٢٢٠).

١٢٧. ئەبا ئەلفەتح کوڕی ورامی ئەلکوردی: یەکێك بوو لە میرە گەورەو بە ناوبانگەکانی خێڵی (جاوان)، ماوەی فەرمانڕەوایەتی نزیکەی نیو سەدەی خایاند، لە ساڵی (٤٢٠)ی کۆچی بەشداری کرد لەشەڕ دژی خێڵەکانی (غەز)ە تورکەکان، لە ساڵی (٤٣٩)ی کۆچی توانی گورزێکی کوشندەیان پێ بگەیێنێ و کۆمەڵێکی زۆری لێیان کوشت و بەدیل گرت و تالانێکی زۆری دەست کەوت، لە ساڵی (٤٥٥)ی کۆچی لە بەغدا کۆچی دوایی کرد و لە (جرجرايا) نێژرا، بڕوانە:
- ابن الاثير، نفس المصدر السابق، الجزء السابع، الصفحة (٧٢٥)، الجزء الثامن، الصفحات (٦٠، ١٨٤).

١٢٨. جاوانییەکان: هۆزێکی کوردی بەناوبانگەو ناوی لە سەرچاوە مێژوویی وڵاتناسەکاندا هاتووە، ئەم هۆزە لە چیاکاندا نشتەجێ بوون، بڕوانە:
- مسعودي، (التنبية والاشراف)، الصفحة (٨٧).
- مروج الذهب، الجزء الثاني.

بەدرێژایی ڕۆژگارو بەهۆی چەندین هۆکاری رامیاری و ئابووری و خێڵایەتی دابەزیونەتە دەشتاییەکانی دیالە (سیروان)و لەوێشەوە بەرەو کەنارەکانی رووباری دیجلە، هەروەها لەگەڵ خێڵەکانی (بەنی ئەسەد) شاری حیللەیان دروستکرد و بەشێك بوون لە دانیشتووانی، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
- مصطفى جواد، (جاوان القبيلة الكردية المنسية)، بغداد، ١٩٧٣، الصفحة (١٢).
- اواز محمد علي عبدالكريم، (الكرد الجاوانيين ودورهم السياسي والحضاري في العهد العباسي)، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية اداب جامعة دهوك، دهوك، ٢٠٠٣.

١٢٩. ابن الاثير، (الكامل)، الجزء الثامن، الصفحة (٢١).

١٣٠. بڕوانە:
- بەدلیسی، (شەرەفنامە)، لاپەڕە (٥٨).

- زەكی بەگ، (خولاصەیەكی تاریخی كورد)، بەشی دووەم، لاپەرە (٢٩٣).
- بابا مەردۆخی روحانی شێوا، (تاریخ مشاهیر كرد امرا وخاندانها)، بەكۆشش محمد ماید مردوخ روحانی، تهران، ١٣٨٢ش، الصفحة (١٠٠).
١٣١. بروانە:
- ابن الاثیر، (الكامل)، الجزء الثامن، الصفحة (٢٢).
- رۆژبەیانی، (مێژووی حەسنەوییو عەیاری)، لاپەرە (٢٠٩).
١٣٢. سیروان: شارێكی مەزنو فراوانە، دەكەوێتە نێوان چیاو دۆڵەوە، زۆر لە شاری مەكە دەچێت، كانیاوی زۆری تێدایە گەرمە بە زستانو ساردە بە هاوین، ناوی ئاودێری بۆ كێڵگەو زەویو زارە كشتوكاڵییەكان پەیدا دەكات، بروانە:
- الیعقوبي، (البلدان)، الصفحة (٣٩).
- شیخ الربوة، (نخبة الدهر)، الصفحة (٢٤٨).
١٣٣. صامغان: سەر بە شارەزوورەو بە فارسی ناوی (بامیان) ە، قەڵایەكی بەهێزی تێدایە، شارۆچكەیەكی بچووكە، سنوورێكی فراوانە لە (بلخ) (١٠) فەرسخ دوورە، بروانە:
- یاقوت، (معجم البلدان)، المجلد الثالث، الجزء الخامس والسادس، الصفحة (١٧٦)، المجلد الاول، الجزء الثاني، الصفحة (٦٢٣).
١٣٤. بروانە:
- ابن الاثیر، (الكامل)، الجزء الثامن، الصفحة (٩٠).
- ابن الوردي، زین الدین عمر بن مظفر، (تأریخ ابن الوردي المسمى بـ(تتمه المختصر))، النجف، ١٩٦٩، الجزء الاول، الصفحة (٣٤١).
- بەدلیسی، (شەرەفنامە)، لاپەرە (٥٧).
١٣٥. نقشبندي، (الكرد في الدینور وشهرزور)، الصفحة (٣١٢).
١٣٦. خەفتیزەكان: دوو قەڵای گەورەن لە ناوچەی هەولێر (اربل)، یەكێكیان لەسەر رێگای مەراغە بوو، قەڵای خەفتیانی زرزاری لەسەر چیا بوو و لەژێری رووبارێكی گەورەو دۆڵێك هەبوو، قەڵای دووەم خەفتیانی سەرخابی كوری بەدر لەسەر رێگای شارەزوور لە هەولێرەوەو ئەم قەڵایە لەوەی یەكەم مەزنترو گەورەتر بوو، بروانە:
- یاقوت، (معجم البلدان)، المجلد الثاني، الجزء الثالث، الصفحات (٢٤٠ - ٢٤١).
١٣٧. بروانە:
- ابن الاثیر، (الكامل)، الجزء الثامن، الصفحات (٤٧٦).
- بەدلیسی، (شەرفنامە)، لاپەرە (٦٠).
١٣٨. ئەبو موسەوور كوری بەدر: كۆتا میری میرنشینی عەنازی بوو، لە پاش مردنی براكەی میر (سەرخاب) فەرمانرەوایەتی گرتە دەستو بۆ ماوەیەك فەرمانرەوایەتی كرد، لە پاش مردنی میر (ئەبو مەنسور) لە ساڵی (٥١١)ی كۆچی میرنشینی عەنازی لە ناوچوو، بروانە:
- شیوا، (تاریخ مشاهیر كرد امرا وخاندانها)، الصفحة (١٠٣).
بەدلیسی ئاماژە بەوە دەكا كە میر (ئەبو مەنسور) كوری میر (سرخاب) بووە، بروانە:
- (شەرفنامە)، لاپەرە (٦١).
١٣٩. راوبۆچوونی جیاواز هەیە لەسەر ساڵی سەرهەڵدانیو دەستپێكی دەوڵەتی سەلجوقی، بۆ زانیاری زیاتر بروانە:
- نیشتیمان بەشیر محەمەد، (كوردو سەلجوقییەكان)، هەولێر، ٢٠٠٦، لاپەرە (١٠٠).
١٤٠. بروانە:
- ابن الجوزي، (المنتظم)، الجزء الثامن، الصفحات (١٦٣ - ١٦٤).
- الاصفهاني، عماد الدین محمد بن محمد بن حامد، (تأریخ دولة ال سلجوق)، بیروت، ٢٠٠٤، الصفحة (٨٧).
١٤١. بروانە:
- حسیني، (اخبار الدولة السلجوقیة)، الصفحة (١٩٧).
- ابن الاثیر، (الكامل)، الجزء العاشر، الصفحة (١٢٨).
- ابن الوردي، (تتمة المختصر)، الجزء الثاني، الصفحة (١٥٧).
١٤٢. بۆ زانیاری زیاتر بروانە:
- ابن الاثیر، (الكامل)، الجزء الثامن، الصفحات (٥٦ - ٥٧).
- فرست مرعي اسماعیل، (الامارات الكردیة)، الصفحات (٣٨٥ - ٣٨٨).
١٤٣. بروانە:
- ابن الاثیر، نفس المصدر السابق، الجزء الثامن، الصفحة (٩٠).
- فرست مرعي اسماعیل، نفس المصدر السابق، الصفحة (٣٩٦).
- نیشتیمان بەشیر محەمەد: (كورد وسلجوقییەكان)، لاپەرە (١٨٥).
١٤٤. هیچ زانیارییەك دەربارەی نییە.
١٤٥. كۆهرائین: (سەعدولدەولە كۆهرائین) یەكێك لە كاربەدەستانی پاشا (كالیجار كوری سوڵتان ئەلدەولە) بوو، پاشان لە خزمەتی سوڵتان (ئەڵب ئەرسەلان) بوو و بە گیانی خۆی پاراستی كاتی (یوسفی خەوارزمی) هێرشی كردە سەر سوڵتان، سوڵتان (مەلیكشا) كردی بە والی (یەمەن)، لە ساڵی (٤٧١)ی كۆچی (شحنكیەی بەغدا)ی پێ سپێردرا لەلایەن (نیزا ئەلمولك) تا لابردنی لە ساڵی (٤٨٦)ی كۆچی لەلایەن (تاج ئەلدەولە تتش) پاشان چووە خزمەتی سوڵتان (محەمەد)و كردی بە جێگری خۆی لە بەغدا، پاشان لایەنگری (بركیارۆق)ی گرت لە شەر دژی براكەی (محەمەد) و لەو شەرەو لە ساڵی (٤٩٢)ی كۆچی كوژرا، بروانە:
- ابن الجوزي، (المنتظم)، الجزء التاسع، الصفحات (١١٥ - ١١٦).
١٤٦. ابن الاثیر، (الكامل)، الجزء الثامن، الصفحة (٣٩٢).
١٤٧. (داقوق "دقوقاء" في التأریخ)، الصفحة (٣٩٢).
١٤٨. بۆ زانیاری زیاتر بروانە:
- ابن الاثیر، (الكامل)، الجزء الثامن، الصفحات (٦٩٨ - ٦٩٩).
- النویري، (نهایة الارب)، المجلد الثاني عشر، الجزء السادس والعشرون، الصفحات (١٥ - ١٦).

- السامرائي، (تأريخ الدولة العربية الاسلامية في العصر العباسي)، الصفحة (٢٨٦).
١٤٩. بڕوانە:
- ابن الأثير، (الكامل)، الجزء التاسع، الصفحات (٦ - ٨).
- ابن الاثير، (التأريخ الباهر في الدولة الاتابكية في الموصل)، الصفحات (٣٤ - ٣٥).
- ابو شامة، شهاب الدين عبدالرحمن بن اسماعيل، (الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية)، الجزء الاول، بيروت، ٢٠٠٢، الصفحة (١٥٥).
١٥٠. شحنە: یاریدەدەرو هاوەڵانی پاشان، زیرەكو بەهرەمەندن لە بەڕێوەبردنی وڵات، بڕوانە:
- الفيروزابادي، (القاموس المحيط)، الصفحة (٦٧١).
- ابن منظور، (لسان العرب)، الجزء الثاني، الصفحة ٢٧٩).
١٥١. بڕوانە:
- ابن خلدون، (العبر)، الجزء الخامس، الصفحة (٢٢١).
- عبد المنعم رشاد، (الموصل في عهد الادارة الاتابكية، موسوعة الموصل الحضارية)، الصفحة (١٥٥).
١٥٢. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
- ابن الاثير، (الباهر)، الصفحات (٣٦ - ٤٢).
- الجميلي، (الدولة الاتابكية في الموصل بعد عماد الدين زنكي)، الصفحة (٤٧).
١٥٣. بڕوانە:
- الجميلي، (الدولة الاتابكية في الموصل بعد عماد الدين زنكي)، الصفحات (٥١ - ٥٢).
- محسن محمد حسين، (اربيل في العهد الاتابكي)، بغداد، ١٩٧٦، الصفحة (٤٠).
١٥٤. بڕوانە:
- ابن العبري، (مختصر تأريخ الدول)، الصفحة (٢٥٧).
- الحنبلي، (شذرات الذهب في اخبار من ذهب)، المجلد الثالث، الجزء الخامس، بيروت، بدون تأريخ، الصفحة (١٤٣).
بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەتابەگییەتی زەنكی بڕوانە:
- عبد المنعم رشاد، (الموصل في عهد الادارة الزنكية، موسوعة الموصل الحضارية)، المجلد الثاني، الصفحات (١٥٤ - ١٨٨).
١٥٥. ابن الاثير، (الكامل)، الجزء التاسع، الصفحة (١٤٢).
١٥٦. حسن ابراهيم حسن، (تأريخ الاسلام، الجزء الرابع، الصفحات (٧٣ - ٧٤).
١٥٧. بڕوانە:
- الديوجي، (تأريخ الموصل)، الجزء الاول.
- محمد ضايع حسون الجبوري، (الخلافة العباسية، دراسة في الاحوال السياسية والادارية والإقتصادية)، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية الاداب، جامعة بغداد، بغداد، ١٩٨٨، الصفحات (٧٠ - ٧١).
١٥٨. بڕوانە:
- ابن الأثير، (الكامل)، الجزء التاسع، الصفحة (١٠٧).
- الحسيني، (اخبار الدولة السلجوقية)، الصفحة (١٧٩).
١٥٩. ابن الاثير، (التأريخ الباهر في الدولة الاتابكية في الموصل)، الصفحة (٥٧).
١٦٠. محمد سهيل طقوش، (تأريخ الزنكيين بالموصل والشام)، لبنان، ١٩٩٩، الصفحة (١٠٣).
١٦١. الجميلي، (الدولة الاتابكية في الموصل بعد عماد الدين زنكي)، الصفحات (٤٧ - ٤٨).
١٦٢. بڕوانە:
- ابن الأثير، (الكامل)، الجزء التاسع، الصفحة (٨٨).
- النويري، (نهاية الارب)، المجلد الثاني عشر، الجزء السابع والعشرون، الصفحة (٩٣).
١٦٣. ابن الاثير، نفس المصدر السابق، الجزء التاسع، الصفحة (١٤٣).
١٦٤. بڕوانە:
- ابن كثير، (البداية والنهاية)، الجزء الثاني عشر، الصفحة (٢١٨).
- النويري، (نهاية الارب)، المجلد الحادي عشر، الجزء الثالث والعشرون، الصفحة (١٧٠).
- رعد زهراو مطشر، (عصر الخليفة المقتفي لامر الله)، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية الاداب، جامعة البصرة، البصرة ١٩٨٧، الصفحة (٥٨).
- القيسي، حسين علي قيس محمد، (طبيعة المجتمع العراقي في العصر العباسي المتاخر)، بغداد، ٢٠٠٧، الصفحة (٤٠).
١٦٥. بڕوانە:
- ابن الأثير، (الكامل)، الجزء التاسع، الصفحة (٢٢١).
- ابن الوردي، (تتمة المختصر)، الجزء الثاني، الصفحة (٥٦).
- النويري، (نهاية الارب)، المجلد الثاني عشر، الجزء السابع والعشرون، الصفحة (٩٣).
١٦٦. بڕوانە:
- ابن الجوزي، (المنتظم)، الجزء الثالث، الصفحة (٥١٤).
- الكتبي، (عيون التواريخ)، تحقيق دكتور فيصل السامر ونبيل عبدالمنعم داود، بغداد، ١٩٧٧، الصفحة (٤٨٧).
- ابن كثير، (البداية والنهاية)، الجزء الثاني عشر، الصفحة (٢١٨).
١٦٧. بڕوانە:
- ابن الأثير، (الكامل)، الجزء التاسع، الصفحة (٤٧٥).
- ابن الاثير، (التأريخ الباهر في الدولة الاتابكية في الموصل)، الصفحة (١٨٣).
- ابن واصل، (مفرج الكروب في اخبار بني ايوب)، تحقيق دكتور جمال الدين، الجزء الثالث، القاهرة، الصفحات (١٥٣).
١٦٨. زەینەددین یوسف كوڕی زینەددینی عەلی: ئەبو ئەلموزەفەر یوسف كوڕی عەلی كوڕی بەگتكین كوڕی محەمەدی توركمانی، بوو بە میری میری هەولێر پاش ئەوەی كە براكەی موزەفەرەددین كۆكبری لابرا، لەلایەن (موجاهیدەدین قایماز) كە سەرپەرشتكاری بوو تاكو ساڵی (٥٧١)ی كۆچی، لە ساڵی (٥٨٦)ی كۆچی لەگەڵ (سەلاحەددین) بەشداری شەڕی خاچپەرستانی كردو لە شاری (ناسیرە) نزیك (عەكا) نەخۆش كەوتو لەوێش كۆچی دوایی كرد لە ساڵی (٥٨٦)ی كۆچی، بڕوانە:
- ابن خلكان، (وفيات الاعيان)، الجزء الثاني، الصفحة

(٢٩٠).
- الصفدي، (الوافي بالوفيات)، الجزء السابع، الصفحة (٢٨٩).
١٦٩. جەزیرەی ئیبن عومەر: شارێکی شوورەدارە، ڕووباری دیجلە وەك کەوانەیەك دەوریداوە، پێشا بە (جەزیرەت ئەلئەکراد) ناسرا بوو، سێ دەرگای هەبوو، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ دوورە لە شاری موسڵ، زەوی‌و زارێکی بە پیتی هەبوو، بڕوانە:
- یاقوت، (معجم البلدان)، المجلد الثاني، الجزء الثالث، الصفحة (٧٥).
- ابن شداد، (الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة)، الجزء الثاني، القسم الاول، دمشق، ١٩٨١، الصفحة (٢٣١).
١٧٠. سەنجەر شا: موعیزەددین پاشا کوڕی غازی پاشا کوڕی مەودود کوڕی ئەتابەگی زەنگی، زاڵم‌و دڵ ڕەق‌و بێ بەزەیی بوو لەگەڵ میللەت‌و سەربازو ئافرەتانی ناو کۆشکدا، منداڵەکانی بەند کردبوو لە قەڵایەکدا، غازی کوڕی توانی هەڵ بێت‌و ڕایکردە موسڵ‌و میری موسڵ پێشوازی لێ کرد، لە ساڵی (٦٠٥)ی کۆچی‌و بە دەستی کوڕی خۆی کوژرا، بڕوانە:
- الذهبي، (سير الاعلام)، الجزء الثاني عشر، الصفحة (٥٩٤).
١٧١. بڕوانە:
- ابن الأثير، (الكامل)، الجزء التاسع، الصفحة (٤٧٦).
- ابن الاثير، (التأريخ الباهر في الدولة الاتابكية في الموصل)، الصفحات (١٨٣ - ١٨٤).
- ابو شامة، (الروضتين)، الجزء الثالث، الصفحة (١٣٠).
- ابن واصل، (مفرج الكروب)، الجزء الثاني، الصفحة (١٥٤).
- النويري، (نهاية الارب)، المجلد الثان عشر، الجزء السابع والعشرون، الصفحة (١٣١).
١٧٢. زێنەددین عەلی کوچك: عەلی کوچك کوڕی بەگتکین کوڕی محەمەدی تورکمانی میری هەولێر، لە میرە بە ناوبانگەکانی دەوڵەتی ئەتابەگییەت بوو، بە ئازایەتی‌و مەردایەتی بە ناوبانگ بوو، ناوی (کوچك)ی لێنرا بە هۆی کورتی باڵای، تووشی کوێری‌و کەری بوو، بۆیە ئەو ناوچانەی کە لەژێر دەسەڵاتیدا بوو گێڕایەوە بۆ دەوڵەت تەنها شاری هەولێر نەبێ کە لەوێ ژیانی بەسەر برد تا کۆچی دوایی تێدا کرد لە ساڵی (٥٦٣)ی کۆچی، بڕوانە:
- ابن خلكان، (وفيات الاعيان)، الجزء الثاني، الصفحة (٢٩٠).
- الصفدي، (الوافي بالوفيات)، الجزء السابع، الصفحة (٢٨٩).
١٧٣. بڕوانە:
- ابو شامة، (الروضتين)، الجزء الثاني، الصفحة (٢٧).
- ابن واصل، (مفرج الكروب، الجزء الاول، الصفحة (٩٧).
١٧٤. بڕوانە:
- ابن الأثير، (الكامل)، الجزء التاسع، الصفحة (٢٢٥).
- ابن خلكان، (وفيات الاعيان)، الجزء الاول، الصفحة (٣٦٥).
- ابن العبري، (تأريخ مختصر الدول)، الصفحة (٢٠٧).
١٧٥. بڕوانە:
- سبط ابن الجوزي، (مرآة الزمان)، المجلد الثامن، الجزء الثاني، الصفحة (٦٨٣).
- ابن خلدون، (العبر)، الجزء الخامس، الصفحة (٢٧٢).
بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەتابەگیەی ئەربل بڕوانە:
- محسن محمد حسين، (اربل في العهد الاتابكي).
- زبير بلال اسماعيل، (اربل في ادوارها التأريخية)، النجف، ١٩٧٠.
١٧٦. بڕوانە:
- ابن الأثير، (الكامل)، الجزء التاسع، الصفحة (٤٧٦).
- ابن الاثير، (التأريخ الباهر في الدولة الاتابكية في الموصل)، الصفحات (١٨٣ - ١٨٤).
- ابو شامة، (الروضتين)، الجزء الثالث، الصفحة (١٣٠).
- ابن واصل، (مفرج الكروب)، الجزء الثاني، الصفحة (١٥٤).
- النويري، (نهاية الارب)، المجلد الثاني عشر، الجزء السابع والعشرون، الصفحة (١٣١).
١٧٧. بڕوانە:
- زبير بلال اسماعيل، (اربل في ادوارها التأريخية)، الصفحة (١٥٧).
- حافظ احمد حمدي، (الدولة الخوارزمية والمغولية)، مصر، ١٩٤٩، الصفحة (١٣٥).
١٧٨. بڕوانە:
- ابن الأثير، (الكامل)، الجزء العاشر، الصفحة (٣٠٠).
- ابن الوردي، (تتمة المختصر)، الجزء الثاني، الصفحة (١٣٦).
- ابن شاهنشاه الايوبي، (مضمار الحقائق وسر الخلائق)، القاهرة، ١٩٦٨، الصفحة (٢٢٥).
- ابو شامه، (الروضتين)، الجزء الثالث، الصفحة (١٥٢).
١٧٩. محسن محمد حسين، (اربيل في العهد الاتابكي)، الصفحات (٧٢ - ٧٣).
١٨٠. بڕوانە:
- حافظ احمد حمدي، (الدولة الخوارزمية والمغولية)، الصفحة (١٣٥).
هەمان توێژەر لە ڕووداوەکانی داگیرکردنی (جەلالەددین منکبرتی) بۆ داقوق دەڵێ: "داقوق بەشێك بوو لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خەلیفە"، لاپەڕە (٢٠٩).
- كمال مظهر احمد، (كركوك وتوابعها حكم التأريخ والضمير)، الصفحة (٢٢).
١٨١. بڕوانە:
- عيسى سلمان واخرون، (العمارات الاسلامية في العراق)، بغداد، ١٩٨٢، الصفحات (١٨٧ - ١٨٩).
- ئەژی، سمکۆ بەهرۆز، (مێژووی هونەری تەلارسازی لە ناوچەی کەرکوکدا لە ڕوانگەی سەردەمە مێژووییەکاندا)، سلێمانی، ٢٠٠٨، لاپەڕە (٩٦).
- زيدان رشيد خان البرادوستي، (الماذن الاتابكية في العراق)، رسالة ماجستير، مقدمة الى جامعة مؤته، مؤته، ٢٠٠٧، الصفحة (٨٦).
١٨٢. بڕوانە:
- دخيل اسود الياس، (العلاقة السياسية بين الخلافة والدويلات الاسلامية في الشام والجزيرة)، رسالة ماجستير، مقدمة الى كلية الاداب، جامعة الموصل، الموصل، ١٩٨٧،

الصفحة (٦).

١٨٣. الذهبي، (تأريخ الاسلام)، الجزء الثاني عشر، الصفحة (٢٦٠).

١٨٤. نەجاح ئەلشەرابی: میر نەجمئەلدەولە ئەبی ئەلیەمەن مەولا ئەلناسر لدین الله.

١٨٥. الذهبي، (تأريخ الاسلام)، الجزء الثاني عشر، الصفحة (٢٦٠).

١٨٦. ابن الاثير، (الكامل)، الجزء العاشر، الصفحة (٤٤).

١٨٧. بڕوانە:

- ابن الاثير، نفس المصدر السابق، الجزء الاول، الصفحة (٦٢).

- الحسيني، (اخبار الدولة السلجوقية)، الصفحة (١٧٧).

١٨٨. قەتەرمش: (ئەبو سەعید قەتەرمش ئەلموستەنجدی، لە میرە گەورەکان بوو، شحەنکیەی بەغدای پێ ڕاسپێردرا، هێمنی بەرقەرار کردو تاوانبارانی بەسزا گەیاند، داقوقی پێ بەخشراو لەوێ نەخۆش کەوتو بۆ بەغدا هێنایانو پێش ئەوەی بگەنە ناو بەغدا کۆچی دوای کرد لە ساڵی (٥٩٠)ی کۆچیو پاش ئەوەی هێنایانە ناو بەغدا، هەواڵی مردنیان بڵاوکردەوەو گەورە پیاوانی دەوڵەتو میرەکان بەشداری پرسەکەیان کرد، بڕوانە:

- الذهبي، (تأريخ الاسلام)، الجزء الثاني عشر، الصفحة (٣٠٦).

١٨٩. ابن الساعي، (الجامع المختصر)، الجزء التاسع، الصفحة (٤٠).

١٩٠. ابن الساعي: نفس المصدر السابق، الجزء التاسع، الصفحات (٢٧ - ٢٨).

١٩١. (الحوادث الجامعة)، الصفحة (٢١٥).

(ڕۆژبەیانی) دەربارەی ئەم دەقەی لای (ئیبن ئەلفوتی) هاتووە دەڵێ: (لەوانەیە سەنقر بە خەلیفەی ووتبێ (دەتووت) واتا (بگرە) مەبەستی سابوونەکەیە، بە هۆی زمان قورسی خەلیفە وایزانی دەڵێ (دقوق)، وادیارە نووسەری (الحوادث الجامعة) شارەزای لە زمانی تورکیا نییە بۆیە ڕوونکرنەوەی دەربارەی ئەم دەقە نەداوە)، بڕوانە:

- (داقوق "دقوقا" في التاريخ)، الصفحات (٤١٠ -٤١١).

لەوانەیە ئەو دەقەی لای (ئیبن ئەلفوتی) هاتووە تەنها گێڕانەوەیەك بێتو دوور بێ لە ڕاستی، چونکە خەلیفە ئەگەر باوەڕی بە لێهاتوویی و بەتوانایی (سەنقر) نەبوایە داقوقی پێ نەدەبەخشی.

١٩٢. (الجامع المختصر)، الجزء التاسع، الصفحة (١٥٠).

١٩٣. ئەرغەش: بەهائەددین ئەرغەش ئەلناسری ئەلرومی، لە مەملوکەکانی خەلیفە (ئەلناسر لدین الله) بوو، کرا بە میری هەولێر دوای مردنی (موزەفەرەدین کۆکبری) لە ساڵی (٦٣٠)ی کۆچی، هەروەها بوو بە میری بەسرە لە ساڵی (٦٣١)ی کۆچی، بڕوانە:

- ابن الفوطي، (الحوادث الجامعة)، الصفحات (١١ - ١٢).

١٩٤. جەمالەددین قوشتمر: پێشەنگی سوپا بوو، میرێکی پایە بەرزو بەرێزو خێرخواز بوو، لە ساڵی (٦٣١)ی کۆچی، کۆچی دوایی کردو نزیکەی (٥٠٠) خزمەتکارو غوڵامی هەبوو، بڕوانە:

- الذهبي، (تأريخ الاسلام)، الجزء الثالث عشر، الصفحة (٦٤١).

١٩٥. ابن الساعي، (الجامع المختصر)، الجزء التاسع، الصفحات (١٨٠ - ١٨١).

١٩٦. ئیبن ئەلمەهدی: (نەسیرەددین ناسر کوڕی مەهدی ئەلعەلەوی) خەڵکی شاری (ڕەی)یە پلەی جێگری وەزارەتی وەرگرت، لە ساڵی (٦٠٢)ی کۆچی کرا بە وەزیرو لە ساڵی (٦٠٤)ی کۆچی لەسەر کارەکەی لابرا بە هۆی خراپی هەڵسوکەوتو ڕفتاری لەگەڵ گەورە میرەکانی خەلیفە ئەلناسر لدین الله، بڕوانە:

- الذهبي، (تأريخ الاسلام)، الجزء الثاني عشر، الصفحة (٥٦٥).

١٩٧. بڕوانە:

- سبط ابن الجوزي، (مراة الزمان في تأريخ الاعيان)، المجلد الثامن، الجزء الثاني، الصفحة (٥٣٥).

- ابن الفوطي، (تلخيص مجمع الاداب)، المجلد الرابع، الجزء الثاني، الصفحة (١٠٠٨).

- ابن الساعي، (الجامع المختصر، الجزء التاسع، الصفحات (٢١٩ - ٢٢٠).

١٩٨. حوسامەددین ئەبو فیراس: (حوسامەددین ئەبو فیراس ئەلحلی ئەلکوردی ئەلورامی) میرێکی ئازاو بەجەرگو بەرێز بوو، لە بەغدا بوو بە میری واست، میری حاجێکانی عێراقو نوێنەری خەلیفە بوو، پانزە جار لەگەڵ موسڵمانەکان بۆ حەج دەرچوو بوو، بە هۆی ناکۆکی لەگەڵ وەزیری قومی عێراقی جێهێشتو پەنای برد بۆ پاشای میسر (ئەلمەلك ئەلکامل) ئەیوبی بەرێزەوە پێشوازی لێ کرد، دوای مردنی وەزیری قومی گەڕایەوە بۆ عێراقو پلەو پایەی خۆی وەرگرتەوە لە مانگی شەوال کۆچی کردو لە گۆڕستانی حوسێن نێژرا، بڕوانە:

- الذهبي، (تأريخ الاسلام)، الجزء الثاني عشر، الصفحة (٥٩٥).

١٩٩. وەزیری قومی: وەزیری گەورە (موئەیەدەدین محەمەد کوڕی محەمەد کوڕی عەبدولکەریم ئەلکاتب) هاوڕێی (ئیبن ئەلقەساب)و (ئیبن ئەلمەهدی) بوو، پاش مردنی نووسەری نەهێنی (ئیبن زیادە) قومی جێی گرتەوەو پاشان پلەی جێگری وەزیری وەرگرت، بە پلەو پایەی بەرزەوە بوو تاکو خەلیفە (ئەلناسر لدین الله) بە دەستخەتی خۆی نووسی (قومی جێگرە لەسەر وڵاتو میللەت)، لە خلافەتی (ئەلزاهیر لدین الله) پلەی بەرزکردو خۆی فەرمانو حوکمی دەردەکرد تاکو لە ساڵی (٦٢٩)ی کۆچی خۆیو کوڕەکەی گیرانو خرانە زیندانو لە ساڵی (٦٣٠)ی کۆچی، کۆچی دوایی کرد، بڕوانە:

- الذهبي، (سير اعلام النبلاء)، الجزء الثالث عشر، الصفحة (١٨٤).

٢٠٠. نەسیرەددین کوڕی ئەلناقد: وەزیری پایە بەرز (نەسیرەددین ئەبو ئەلئەزهەر ئەحمەد کوڕی عەلی بەغدادی) لە ساڵی (٥٧١)ی کۆچی لەدایکبوو، شیربرای خەلیفە (زاهیر)

بوو، لە ساڵی (٦٢٩)ی كۆچی بوو بە وەزیر دوای گرتنی (ئیبن ئەلقومی)و لە ساڵی (٦٤٢)ی كۆچی، كۆچی دوایی كرد، بڕوانە:
– الذهبي، (سير الاعلام)، الجزء الثالث عشر، الصفحة (٢٦٧).
٢٠١. ابن الفوطي، (الحوادث الجامعة)، الصفحة (٤٢).
٢٠٢. الصفدي، (نكث الهميان في نكت العميان)، الصفحة (٣٨٩).
٢٠٣. قوتبەددین سەنجەر ئەلسەنقەری: لە مەملوكەكانی خەلیفە (ئەلناسر لدين الله) بوو، كرا بە والی خوزستان دوای مردنی (تاشتكین) ساڵی (٦٠٣)ی كۆچیو لە خەلیفە هەڵگەڕایەوەو یاخیبوو تا لە ساڵی (٦٠٧)ی كۆچی گیرا، پاشان خەلیفە لێی خۆشبوو، بڕوانە:
– الذهبي، (تأريخ الاسلام)، الجزء الثاني عشر، الصفحات (٥٧٤ – ٥٧٥).
٢٠٤. ابن الفوطي، (الحوادث الجامعة)، الصفحة (٢١٥).
٢٠٥. محەمەد كوڕی سەنقەر ئەلتەویل: كوڕی میر سەنقەری درێژە، كرا بە میری شارەزوور لە سەردەمی خەلیفە (ئەلموستەعسم بالله)و لە ساڵی (٦٤٢)ی كۆچی هەڵات بۆ چەند قەڵایەك پاش هاتنی تەتارەكان، بڕوانە:
– ابن الفوطي، (الحوادث الجامعة)، الصفحة (٢١٥).
٢٠٦. ابن الفوطي، (الحوادث الجامعة)، الصفحة (٢١٥).
٢٠٧. خالس: شارێكی گەورەیە دەكەوێتە ڕۆژهەڵاتی بەغدا، بڕوانە:
– ياقوت، (معجم البلدان)، المجلد الثاني، الجزء الثاني، الصفحة (٢٠٩).
٢٠٨. بڕوانە:
– ابن الفوطي، (تلخيص مجمع الاداب)، المجلد الرابع، الجزء الثاني، الصفحة (٩٦٠).
– (جامع المختصر)، الجزء التاسع، الصفحات (٢١٩ – ٢٢٠).
٢٠٩. خەوارزم: هەرێمێكی گەورەو فراوانەو شارێكی زۆری تێدایەو زۆر ئاوەدانە، لە باكوورو ڕۆژئاوا سنووری لەگەڵ وڵاتی توركە (غەز)، لە باشوور خوراسانو لە ڕۆژهەڵات وڵاتی دوای ڕووبار، بڕوانە:
– ابن حوقل، (صورة الارض)، الصفحة (٤٧٧).
– الحميري، (الروض المعطار)، الصفحة (٢٤٤).
٢١٠. بڕوانە:
– عبدالرحمن شرف، (زبدة القصص)، ١٣١٥ هجري، الجزء الاول، الصفحة (٣٩٣).
– محمد احمد سعد، (موسوعة التأريخ الهجري)، الصفحة (٢٥٢).
٢١١. ابن الاثير، (الكامل)، الجزء الثامن، الصفحة (٤١١).
٢١٢. بڕوانە:
– النسوي، (سيرة السلطان جلال الدين منكبرتي)، تحقيق حافظ احمد حمدي، مصر، ١٩٥٣، الصفحة (٢١).
بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی دەوڵەتی خەوارزم بڕوانە:
– حافظ احمد حمدي، (الدولة الخوارزمية و المغولية)، مصر، ١٩٤٩.

٢١٣. هۆكاری جیاوازی لەنێوان دەوڵەتی (خەوارزم)و خەلافە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سوڵتان (عەلائەدین تەكش) و كوڕەكەی (محەمەد)، هەوڵیان دەدا جێگەی سەلجوقییەكان بگرنەوە، سوڵتان (جەلالەددین) خەلیفە (ئەلناسر لدين الله) ی تاوانبار دەكرد بە هەندێك تاوان وەكو ناردنی نامە بۆ (ئەختا)و دەوڵەتی (غوری)، بڕوانە:
– فوئاد عەبدولموعتی ئەلسەییاد، (مەغۆل لە مێژوودا)، وەرگێڕانی: نیهاد جەلال، هەولێر، ٢٠٠٨، لاپەڕەكانی (٧٩ – ٨٠).
٢١٤. تستر: بە عەرەبكراوی (شوشتەر)ە، گەورەترین شارە لە خوزستانو دەكەوێتە بەرزایی، بڕوانە:
– ياقوت، (معجم البلدان)، المجلد الاول، الجزء الثاني، الصفحة (٤٤٣).
خۆشترینو جوانترین شارەكانی خوزستانە، ڕووبار دەوریداوە باخو بێستانی خورمای تێدایە، بڕوانە:
– مقدسي، (احسن التقاسيم)، الصفحة (٤٠٩).
٢١٥. بەعقوبا: دێیەكی گەورەیە وەك شارە، لەو ناوچانەیە كە سەر بە ڕێگای خوراسانە، باخو بێستانو ئاوی زۆرە، (١٠) فەرسەخ لە بەغدا دوورە، بڕوانە:
– ياقوت، (معجم البلدان)، المجلد الاول، الجزء الثاني، الصفحة (٣٥٧).
٢١٦. ابن الاثير، (الكامل)، الجزء العاشر، الصفحات (٣٨٨ – ٣٨٩).
٢١٧. سبط ابن الجوزي، (مراة الزمان)، المجلد الثامن، الجزء الثاني، الصفحة (٦٣٤).
٢١٨. النويري، (نهاية الارب)، المجلد الثاني عشر، الجزء السابع والعشرون، الصفحة (١٨٤).
٢١٩. بڕوانە:
– النسوي، (سيرة السلطان جلال الدين منكبرتي)، الصفحة (١٩٣).
– ابن الاثير، (الكامل)، الجزء العاشر، الصفحة (٣٨٩).
– الحميري، (الروض المعطار)، الصفحة (٢٤٤).
٢٢٠. اليافعي، (مراة الجنان وعبرة اليقضان)، الجزء الثاني، بيروت، ١٩٧٠، الصفحة (١٥٦).
٢٢١. بڕوانە:
– سبط ابن الجوزي، (مراة الزمان)، المجلد الثامن، الجزء الثاني، الصفحة (٦٣٤).
– ابن كثير، (البداية والنهاية)، الجزء الثالث عشر، الصفحة (٩٥).
– زەكی بەگ، (خولاصەیەكی تأریخی كورد)، بەشی یەكەم، لاپەڕە (١١١).
٢٢٢. ابن الاثير، (الكامل)، الجزء العاشر، الصفحة (٣٩٠).
٢٢٣. بت: دێیەكە لە شار دەچێ سەر بە بەغدایەو دەكەوێتە نزیك ڕازان، بڕوانە:
– ياقوت، (معجم البلدان)، المجلد الاول، الجزء الثاني، الصفحة (٢٦٦).
٢٢٤. ابن الاثير، (الكامل)، الجزء العاشر، الصفحة (٣٨٩).
٢٢٥. بڕوانە:

- الحميري، (الروض المعطار)، الصفحة (٢٤٤).
- زەکی بەگ، (خولاصەیەکی تأریخی کورد)، بەشی یەکەم. لاپەرە (١١١).
٢٢٦. بروانە:
- الغياثي، (التأريخ الغياثي)، تحقيق: طارق نافع الحمداني، بغداد، ١٩٧٥، الصفحة (٤١).
- دائرة المعارف الاسلامية، المجلد السابع، العدد الاول، الصفحة (١٢٦).
- عبدالرحمن شرف، (زبدة القصص)، الجزء الثاني، الصفحات (١١٥ - ١١٦).
٢٢٧. مؤلف مجهول، (لغات تأريخية وجغرافية)، باللغة التركية، الجزء الثاني، استنبول، ١٢٩٩، الصفحة (٢٠٤).
٢٢٨. بروانە:
- حافظ احمد حمدي، (الدولة الخوارزمية والمغولية)، الصفحات (١١١ - ١١٤).
- ئەلسەبیاد، (مەغۆل لە مێژوودا)، لاپەرە (٦٠).

*encyclopedia - William beut. (the New Britannica). VI. P.P. (995 - 994).*

٢٢٩. بروانە:
- ئەلسەبیاد، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٦٢ - ٦٦).
- عبدالرحمن شرف، (زبدة القصص)، الجزء الثاني، الصفحات (١١٧ - ١٢٠).
٢٣٠. بروانە:
- ابن الفوطي، (الحوادث الجامعة)، الصفحة (٢٦٢).
- الغياثي، (التأريخ الغياثي)، الصفحة (٤٢ - ٤٣).
- الهمداني، رشيد الدين فضل الله، (جامع التواريخ)، المجلد الثاني، الجزء الاول، مصر، ١٩٦٠، الصفحة (٢٩٤).
٢٣١. ابن الاثير، (الكامل)، الجزء العاشر، الصفحات (٣٤٨ - ٣٤٩).
٢٣٢. بروانە:
- ابن الاثير، نفس المصدر السابق، الجزء العاشر، الصفحة (٣٤٩).
- ابن خلدون، (العبر)، الجزء الخامس، الصفحة (١١٤).
٢٣٣. بروانە:
- ابن الاثير، نفس المصدر السابق، الجزء العاشر، الصفحة (٣٤٩).
- ابن واصل، (مفرج الكروب)، الجزء الرابع، الصفحة (٤٩).
٢٣٤. بروانە:
- ابن الاثير، نفس المصدر السابق، الجزء العاشر، الصفحات (٣٤٩ - ٣٥٠).
- النويري: (نهاية الارب)، المجلد الثاني عشر، الجزء السابع والعشرون، الصفحة (٢١٧).
- ابن خلدون، (العبر)، الجزء الخامس، الصفحة (١١٢).
٢٣٥. ئيبن ئەلفوتی ئەم رووداوە لە رووداوەکانی ساڵی (٦٢٩)ی کۆچی باس کردووە، بروانە:
- (الحوادث الجامعة)، الصفحة (٢٧).
٢٣٦. ئیوائییەکان: هۆزێکی تورکمانین لەگەڵ سەلجوقییەکاندا هاتن و لە (ئەسەد ئاباد)ی خوارووی هەمەدان نیشتەجێ بوون و بنەماڵەی (پەرچەم) سەرکردایەتیانی دەکردو لەسەر دزیو تاڵانو چەتەیی دەژیانو شەڕو پێکدادانیان هەبوو لەگەڵ خلافەو سەلجوقییەکانو جەلالەددین مەنکبرتی، بروانە:
- ابن الاثير، (الكامل)، الجزء العاشر، الصفحة (٤١٧).
٢٣٧. جورقانەکان: لە راستی (گۆران)ە، خێڵێکی کوردییە لە چیاکان (هەرێمی چیا) نیشتەجێ بوون، بروانە:
- المسعودي، (التنبيه والاشراف)، الصفحة (٧٨).
لە (حەلوان)و (دەرتەنگ)و (شابور خواست) نیشتەجێ بوونو رۆڵێکی کاریگەرییان هەبوو لە رووداوە رامیارییەکان لە ناوچەکە، بۆ زانیاری زیاتر بروانە:
- زرار صديق توفيق، (القبائل والزعامات الكردية)، الصفحة (٧١).
٢٣٨. بروانە:
- ابن الاثير، (الكامل)، الجزء العاشر، الصفحة (٤٥٠).
- ابن واصل، (مفرج الكروب)، الجزء الرابع، الصفحة (٣٢٨).
٢٣٩. المقريزي، (السلوك في معرفة دول الملوك)، تحقيق: محمد عبدالقادر عطا، الجزء الاول، بيروت، ١٩٩٧، الصفحة (٣٦٣).
٢٤٠. ابن الاثير، (الكامل)، الجزء العاشر، الصفحة (٤٥٠).
٢٤١. ابن الفوطي، (الحوادث الجامعة)، الصفحة (٢٧).
٢٤٢. بروانە:
- ابن الاثير، (الكامل)، الجزء العاشر، الصفحة (٤٥٠).
- ابن واصل، (مفرج الكروب)، الجزء الرابع، الصفحة (٣٢٨).
- النويري، (نهاية الارب)، المجلد الثاني عشر، الجزء السابع والعشرون، الصفحة (٢٣٥).
- مصطفى جواد، (كركوك في التأريخ)، مجلة الاخاء، الصفحة (١٨).
٢٤٣. ابن واصل، نفس المصدر السابق، الجزء الرابع، الصفحة (٤٥٠).
٢٤٤. بروانە:
- سبط ابن الجوزي، (مراة الزمان)، الجزء الثامن، الكتاب الثاني، الصفحة (٦٧٠).
- ابن تغري بردي، (النجوم الزاهرة)، الجزء السادس، الصفحات (٢٧٦ - ٢٧٧).
٢٤٥. الذهبي، (تأريخ الاسلام)، الجزء الثالث عشر، الصفحة (٨).
٢٤٦. ابن الفوطي، (الحوادث الجامعة)، الصفحة (١٠٩).
٢٤٧. زەنگاباد: شارێکە دەکەوێتە کەناری رۆژئاوای رووباری (سیروان)و ناوی راستەقینەی (زەند - ئاباده) واتا شوێن مۆڵگەی خێڵی زەند، بروانە:
- بابان، (اصول اسماء المدن والمواقع العراقية)، الصفحة (١٩٦).
٢٤٨. سامەرا: شارێکە دەکەوێتە نێوان بەغداو تکریت لە رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە، خەلیفە (ئەلموعتەسەم بالله)ی عەباسی نۆژەنی کردەوە، بروانە:
- ياقوت، (معجم البلدان)، المجلد الثالث، الجزء الخامس،

الصفحة (١٠).

٢٤٩. موجاهیدەدین ئەلدویدار: (پاشا) پێشەوای سوپای عێراق بوو، یەکێکە لە سەرکردە ئازاو بە ناوبانگ بوو بەهێزەکان. هەمیشە دەیوت: "گەر خەلیفە بواری پێم بدایە تەتارم دەبەزاند، وام لە هۆلاکۆ دەکرد سەری لێ بشێوێ". بە دەستی هۆلاکۆ کوژراو سەری لە شاری موسڵ هەڵواسرا، بڕوانە:

– الذهبي، (سیر الاعلام)، الجزء الثالث عشر، الصفحة (٤٠٧).

٢٥٠. شەرەفەددین ئیقبال ئەلشەرابی: نازناوی (جەمال ئەلدەولە ئەمیر ئەلجیوش شەرفەددین) بوو، لە ساڵی (٦٢٦)ی کۆچی بوو بە پێشەوای سوپای عێراق، ژمارەیەك قوتابخانەی دروستکرد، لە ساڵی (٦٤٣)ی کۆچی ڕووبەڕووی تەتارەکان بوو و بەزاندیانی و بەمەش پلەو پایەو شکۆمەندی بەرزتر بوو، لە ساڵی (٦٥٣)ی کۆچی لە بەغدا کۆچی دوایی کرد، بڕوانە:

– الذهبي، (سیر الاعلام)، الجزء الثالث عشر، الصفحات (٤٠٧ – ٤٠٨).

٢٥١. بڕوانە:

– ابن العبري، (مختصر تأريخ الدول)، الصفحة (٢٥١).

– ابن الفوطي، (الحوادث الجامعة)، الصفحة (١٠٩).

٢٥٢. ابن الفوطي، (الحوادث الجامعة)، الصفحات (١٠٩ – ١١٠).

٢٥٣. عباس اقبال، (تأريخ المغول)، ترجمة: عبد الوهاب علوي، ابو ظبي، ٢٠٠٠، الصفحة (١٦٨).

٢٥٤. ڕانگاو: هیچ شتێك دەربارەی نییەو پێدەچێت مەبەست (زەنگاباد)ی نزیك خانەقینە.

٢٥٥. ابن الفوطي، (الحوادث الجامعة)، الصفحات (٢٤١ – ٢٤٢).

٢٥٦. کریت: قەڵایەکە لە باشووری (خورەم)ی ئێستا، بڕوانە:

– طوسي، (ذيل خواجة نصير الدين طوسي برجهانگشاي جويني)، تصحيح: محمد قزويني، ايران، ١٣٨٢ ش، الصفحة (٤٧٢).

٢٥٧. بەیات: شارۆچکەیەکە لەسەر سنووری عێراق – ئێران لە لورستان (پشتکێو) بەرامبەر مەندەلی، شوێنی هۆزی بەیات بوو تا (شارودی خان) هاتو وێرانی کردو هۆزی بەیاتی دوور خست، بڕوانە:

– الروزبياني، (داقوق "دقوقا" في التأريخ)، الصفحة (٤١٤).

٢٥٨. الطوسي، (ذيل خواجة نصير الدين طوسي)، الصفحة (٢٨٢).

*** کوردستان لە ڕۆژگاری فتوحاتی ئیسلامی و شوێنی لە سیستەمی کارگێڕیی خیلافەی ئیسلامیدا :-**

د.زرار سدیق ناروجەیی

*** شەڕی جەلەولاو گەیشتنی عەرەبە موسڵمانەکان بە کوردستان :**

لە درێژەی شەڕو لێکدانەکانی نێوان ساسانییەکان و عەرەبە موسڵمانەکان لە سەردەمی خەلیفە عومەرو شکستی لە شکری ساسانی لە شەڕەکانی قادسییە و مەدائین و کوژرانی ڕۆستەمی سەرلەشکریان، لە ساڵی (١٦ك / ٦٣٧)ز، پاشماوەی لەشکری ساسانی پاشەکشێیکردو بۆ پشوودان و خۆڕێکخستنەوە لە شارەدێی جەلەولا گیرسایەوە، لێرە بەدواوە دەڤەرە کوردنشینەکانی سەر سنووری عێراق بوونە گۆڕەپانی شەڕ[1].

لە میانەی ئەم شەڕانەدا ژمارەیەك سەرکردەو هەزاران جەنگاوەر لە بەرگریکاران هاتنە کوشتن، سەرچاوەکان زیادەڕۆییان کردووەو زیانی گیانیی سوپای ساسانییان بە سەد هەزار داناوە گوایە لاشەکانیان شەپۆلیاندەداو بۆیە شوێنەکە ناونرا جەلەولا.

*** (گرتنی حەلوان و ماسبزان و شارەزوورو گەرمیان):-**

لەگەڵ گرتنی جەلەولا، موسڵمانەکان درێژەیاندا بە لەشکرکێشی، سەرکردە (جەریر کوری عەبدوڵلا ئەلبەجلی) کە بۆ بەرگە گرتن لە دژە هێرش بە دووهەزار کەسەوە لە جەلەولا مابۆوەو پاشان نزیکەی سێ هەزار شەرکەری دی بۆ نێردرا، چووە سەر حەلوان و خانەقین و شەڕی پاشماوەی سوپای ساسانی کردو ژمارەیەکی لێکوشتن و لە ناویاندا مەهرانی رازی، بەدواییدا شارەکانی (مەندەلی – البندنیجین) و قەسر شیرین و گشت ناوچەکە داگیر کران، بە فرمانی خەلیفە عومەر هێزێکی تر شاڵاوی بردەسەر ناوچەی سیروان و بەشەر ماسبزان – ناوەندی سیروانییان گرت و خەڵکەکە بەرەو ناوچە شاخاوییەکان هەڵهاتن (المنتظم، ٤/ ٢١٦، ابن الاثیر، الكامل، ٢/ ٤٨٤).

دوای قایمکردنی حەلوان و خۆسازدان و سەنگەرکردن لە دژەهێرش، هاشم کوری عەتبە ڕووەو کرماشان و دینەوەر کەوتەڕێ و کرماشانی گرت و دەگەڵ خەڵکەکە لە سەر هەمان ڕێکەوتنی حەلوان پێکهاتن وەلێ نەشیا دینەوەر بگرێت و گەڕایەوە حەلوان (فتوح البلدان، ص ٢٩٩).

حەلوان کرایە بارەگای والیی موسڵمانەکان و خاڵی سازدان و لەشکەرکێشی بۆ ناوچەکانی دەورووبەر، لەشکری ئیسلامی لە حەلوانەوە بە هەموو ئاراستەیەکدا بەردەوامیان بە پێشرەویداو باژێڕو قەڵا و گوندەکانی شارەزوورو گەرمیان ڕاستەوخۆ کرانە بەشێك لە ئامانجیان، بەڵام بەدرێژایی شەش ساڵ (١٦– ٢٢ك/ ٦٣٧ – ٦٤٣ز) نەشیان شارەزوور بگرن، لەو ماوەیەدا والیی حەلوان عزرە یان عرەوە کوری قەیس نەیتوانی پەی بە قەڵا قایمەکانی شارەزوور بباتو داگیریان بکات.

هاوکات سەعەد کوری ئەبی وەقاس فەرماندەی گشتیی بەرەی عێراق فرمانی بە هاشم کوری عەتبە دا ڕووبکاتە دەڤەری گەرمیان، ئەویش بە یاوەری سەرکردەیەکی تر توانی بەسەر داقوق و (خانیجار – کانی هەنجیر) لە نزیك خورماتوو – و سەرپاکی دەڤەری گەرمیان تا سنووری شارەزوور زاڵببێت، وا دیارە ئەم هەوڵەش مایەپوچ بووەو گرتنی یەکجارەکیی گەرمیان دواکەوت تا دەورووبەری ساڵی (٢٠ك/ ٦٤١)ز (فتوح البلدان، ص ٣٢٨).

لە هەواڵێکی دیدا خەلیفە عومەر، عەتبە کوری فەرقەدی راسپارد بەرەو مووسڵ و نەینەوا پێشرەوی بکات، ئەویش لە ساڵی (٢٠ك/ ٦٤١ز) مووسڵ و دەڤەری گەرمیانی گرت (فتوح البلدان، ص ٢٦٥).

لە میانەی شەڕو پێکدادانی نێوان عەرەبە موسڵمانەکان و لەشکری ساسانی و بە تایبەت لە هەردوو شەڕی جەلەولا و نەهاوەند بە هەزاران کەس لە هەردوو ڕەگەز بەدیلی کەوتنە دەست لەشکری ئیسلامی و بەدەستکەوتی شەڕ دانران و بۆ ناسنەوەو لێکجیاکردنەوەیان ملیان داخدەکرا، ئەمە وێڕای تاڵانکردنی موڵك و ماڵ و سامانی دەڤەرە فەتحکراوەکان (فتوح البلدان، ص ٢٧٢).

سەرلەشکر ئەلقەعقاع کوری عومەرو پاش ئەوەی باژێڕەکانی جەلەولا و حەلوان و خانەقین و قەسری شیرینی داگیر کردو گشت ناوچەکەی کۆنترۆڵکرد گەلێك لە کچان و ژنانی ئازادی دەستبەسەر کرد کە پێشتر هەرگیز دەستکەوتی وا مەزنیان بەرچاوەنەکەوتبوو، پاشان ناردنی بۆ هاشم کوری عەتبە، ئەویش هەڵستا بەسەر جەنگاوەرە عەرەبەکاندا دابەشیکردن و کردیانن بە کەنیزە – جاریە[2] (واصحاب القعقاع سبایا فارسلهن الی هاشم، فقسمهن، فاتخذن فولدن) (تاریخ الطبري، ٤/ ٢٨، الكامل، ٢/ ٤٨١).

ڕێژەی ئەم ئافرەتە دیلکراوانە هەندە زۆربووو هەندە ستەم و بێدادییان دەرهەق ئەنجامدرا تا ئەو ئاستەی خەلیفە عومەر بڵێت: (اللهم انی اعوذ بك من اولاد سبایا الجلولیات) (الاخبار الطوال، ص ١٢٢).

*** (نیشتەجێبوونی عەرەب):**

یەکێك لە دەرهاویشتەو ئەنجامەکانی پرۆسەی فەتحی هەرێمەکانی کوردستان و هەموو هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ئەوەبوو کە خەڵکێکی زۆر لە خێڵ و تیرەو بنەماڵە عەرەبەکان بە تاك و بە کۆمەڵ، نەخاسمە لەوانەی بە شەرکەرو جەنگاوەر دادەنران بە شارو باژێڕو گوندو چیاو دەشت و کەژی کوردستانادا بڵاوبوونەوەو هێدی هێدی ئاکەنجیدە بوون، هۆکارو پاساوی ئەم دیاردەیە بەر لە هەموو شتێك ئەوەبوو کە ئەوان شوێنە فەتحکراوەکانیان بە موڵکی شەرعی خۆیان دەزانی و دەخرانە ریزی دەستکەوتەکانی جەنگەوە بە تایبەت ئەو شارو دەڤەرانەی بە شەڕو بە نووکی ڕم داگیردەکران و خەڵکە بەرگریکارەکە لە کوشتن و دیلکردن دەرباز دەبوون شاربەدەر دەکران.

ئەو زەوییوزارانەی وا زەوتدەکران، پتر خاکی بە پیت و بەراو بوون لە ڕەزو باخ و بێستان پێکدەهاتن، عەرەبەکان

دانیشتووانە ڕەسەنەکانیان بە سەپان دەگرت‌و بە سوخرە کاریان پێدەکردن‌و مووچەیانیش نان و زگ بوو، فەقیهەو شەرعزانەکان ئەحکام‌و یاساو ڕێسای بە گەرخستنی ئەم موڵك‌و زەوی و زارانەیان داناوەو بە دەستکەوتێکی حەڵاڵ‌و ڕەوایان ژماردووە.

نیشتەجێکردنی عەرەبەکان بۆ ئەوەش بوو پرۆسەی فەتحکردن ڕانەوەستێت‌و تابکرێت درێژەی پێبدرێت، دەوڵەتی ئیسلامی دەیتوانی لەم ڕێگایەوەو بەم شێوازە پێی خۆی قایمتر بکات‌و دەسەڵاتی بچەسپێنێت.

فەرماندە گشتییەکان‌و سەرلەشکرە مەیدانییەکان، هەر شارو ناوچەیەکیان بگرتایە، هەڵدەستان بە بەرنامە هەرچی موڵکی بەپیت‌و کێڵگەو ڕەزوباخ هەیە بەخزم‌و کەسوکارو لایەنگرانیان دەبەخشی، خەلیفەکانیش ئەم کارەیان لاپەسندبوو و پشتگیرییان لێدەکرد، بۆ نموونە کاتێك معاویە کوڕی ئەبی سوفیان لەلایەن خەلیفە عوسمانەوە کرایە والی شام‌و جەزیرە، خەلیفە ڕێگەی پێدا هۆزە عەرەبەکان لە شوێنە چەپ‌و تەریکەکان نیشتەجێ بکات وڕێگایان بدات زەوی و زارە بێ خودانەکان، واتە ئەوانەی خودانەکانیان کوژرابوون یان هەڵهاتبوون بەناوبهێنن، ئەویش چەند تیرەیەکی لە هۆزەکانی تەمیم‌و قەیس‌و ئەلئەسەد لە چەند شوێنێك ئاکەنجی کرد (فتوح البلدان، ص١٨٢، یاقوت الحموی، معجم البلدان، ٤/ ١٩٥).

*** (کوردستان لە سیستەمی کارگێڕیی ئیسلامیدا)**

بێگومان سیستەمی دابەشکردنی دەوڵەتی ئیسلامی بەسەرچەند هەرێمێکداو هەرێمەکانیش بەسەر کورە - پارێزگاو ولایەتێکدا، زێدەتر لە ڕۆژگاری سەروەری‌و بەهێزیی خیلافەی ئیسلامی‌و باڵادەستی دەسەڵاتی ناوەندی پەیرەودەکرا، لەپێناو ئاسانکاری‌و دروست ڕاپەڕاندنی ئەرك‌و فرمانەکان، بۆ هەر یەکەیەکی کارگێڕی والی‌و باجگرو قازی‌و پۆستەبەرو سەرکردەی لەشکری دادەنران‌و لەپێناو گورجکردنی کاروباری دارایی‌و ڕێگری لە گەندەڵی فەرمانبەران‌و خۆدزینەوەی هاووڵاتیان لە باجدان‌و کۆکردنەوەی باج‌و خەراج‌و داهاتەکان، دەوڵەت لە هەر یەکێکیاندا بەرپرسی دارایی‌و خەمڵێنەرو باجگرو نوسەری دادەنا، لە سەردەمی لاوازی‌و بێدەسەڵاتی خەلیفەکان‌و گرتنی بەغدای پایتەخت لەلایەن بوەیهییەکان لە ساڵی (٣٣٤ك/ ٩٤٦ز)و پاشان لەلایەن تورکە سەلجوقییەکانەوە لە ساڵی (٤٤٧ك/ ١٠٥٥ز) و سەرهەڵدانی چەندین دەوڵەت‌و میرنشین‌و فەرمانڕەوایی لە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوای جیهانی ئیسلامی‌و جیابوونەوەی چەندین هەرێم‌و ولایەت لە جەستەی خیلافەی عەباسی، سیستەمی کارگێڕی بەهاو سوودی خۆی لە دەستداو تەنها وەك ڕووخسار مایەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی سنووری نێوان هەرێمەکان بەجێگیریی نامانەوەو بەهۆی دەستاودەستکردنی دەسەڵاتەوە بەردەوام دەستکاری دەکران (الاعلاق الخطیرة ٣/ ٧).

ولاتی کورد - کوردستان لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە بەسەر ئەم هەرێمانە دابەشدەکرا.

١- هەرێمی چیاکان - کوێستان‌و شارەزوور (اقلیم الجبال).

٢- هەرێمەکانی ئازەربیجان‌و ئەرمینیاو ئاران (اقلیم الرحاب).

٣- هەرێمی جەزیرە (اقلیم الجزیرە).

٤- هەرێمی خوزستان (اهوان).

*** (هەرێمی جەزیرە)**

جەزیرە واتا ئەو ناوچانەی دەکەونە نێوان هەردوو ڕووباری دیجلەو فوراتەوەو ئەم دوو ڕووبارە دەبنە سنووری سروشتیی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای هەرێمەکە، هەرچەندە هەندێك شارو دەڤەر هەبوون دەکەوتنە ڕۆژهەڵاتی دیجلەوە یان ڕۆژئاوای فوراتەوە کەچی لە ڕووی ڕێڤەبەرییەوە هەر سەر بە جەزیرە بوون. جەزیرە لە باشوورەوە دادەکشا تا قەڵای تکریت لە سەر دیجلەو بازێڕی هیت لە سەر فورات‌و هێڵی نێوان تکریت - هیت دەبووە سنووری نێوان جەزیرەو عێراق، هەرچی لە باکووریشەوەیە ئەوا هاوسنووری ئەرمینیاو ولاتی ڕۆم بوو (صور الارض، ص ١٨٩، مختصر البلدان، ص ١٢٣، معجم البلدان، ٢/ ٥٤).

المقدسی جەزیرەی بە (اقلیم اقور) ناوبردووەو لەسەر بنەمای خێڵەکی دابەشیکردووە بەسەر دیار ڕەبیعەو دیار میسرو دیار بەکر، بەناوی ئەو خێڵە عەرەبانەی کەوا لە سەردەمی پێش ئیسلامەوە جەزیرەیان کردبووە هەواری خۆیان (احسن التقاسیم، ص ١٢١ - ١٢٢)، ئەم دابەشکردنە هەرچەند تا سەدەکانی دوایی لە پەرتوکە جوگرافییەکاندا یاداشتدەکرا، بەڵام لە واقیعدا هەبوونێکی کاریگەری نەبوو (الاعلاق الخطیرة، ٣/ ٥٤).

کورد لە مێژەوە پێکهاتەیەکی ڕەسەن‌و بنەڕەتیی دانیشتووانی جەزیرە پێکدەهێنێت، مێژوویەکی دێرین‌و ڕەگدا کوتاوی لەو هەرێمە هەیە، ناوچەکانی باکوورو ڕۆژهەڵاتی جەزیرە لە هەموو قۆناغە مێژووییەکاندا بەشێوەیەکی گشتی کوردنشین بوون‌و بە بەشێکی سەرەکی نیشتمانیی کورد دادەنرێن کە شارو بازێڕەکانی: ئامەد، میافارقین، حوصنکێفا، شنگار، بۆتان، جزیرە ابن عمر، سعرد، نەصیبین، ئەرزنی دەگرتەوە، تەنانەت بازێڕی بۆتان تا ناوەڕاستی سەدەی ٣ك/ ٩ز بە جزیرە الاکراد دەناسرا تا کابرایەکی عەرەب هات‌و هەندێك خانوی تیادا ئاوا کردو ئیتر بە جزیرە ابن عمر ناوی دەرکرد (الاعلاق الخطیرة ٣/٧).

چیاکانی تەنیشت مووسڵ لە ڕۆژهەڵاتەوە بە داسن دەناسران، دەڤەرە سەخت‌و شاخاوییەکانی ڕۆژهەڵاتی داسن‌و چاوگەکانی زێی مەزن‌و ڕووباری خابور بە هەکاری دەناسران کە هەنوکە بادینان‌و شومزینان دەگرنەوە، ئەم دوو دەڤەرە شاخاوییە لە گەڵ وڵاتی هەولێردا هەرچەند ناکەوتنە نێوان دیجلەو فوراتەوە کەچی سەر بە مووسڵ بوون‌و مووسڵیش ناوەندی هەرێمی جەزیرە بووو لە ڕێگای والیی مووسڵەوە نوێنەرو جێگریان بۆ دادەنرا.

بە درێژایی سەردەمی ئیسلامی دەیان گوندو دەڤەرو شارەدێی کوردنشین ناوبانگیان هەبوو وەك: باعەزرا،

باهەدرا، داسن، باجلێ، بابەغێش، باجرمێ، خانیجار، کانی هەنجیر، خورماتوو، حەززەی نزیك هەولێر، ئەردمشت، ئەمانەش سەر بە مووسڵ بوون (المسالك، ص ٨٥، مختصر البلدان، ص١٢٥).

هەروەها لە سەدەکانی دواییدا ژمارەیەکی دی شارو شارۆچکەو قەڵا ناوبانگیان پەیدا کرد وەك: (هەولێر - اربل)و ئاکرێو (الحسنیە - زاخۆ) و (خەفتیان - هاودیان)، (هرور، ئامێدی، لە سەردەمی عەباسی مووسڵو دەوروووبەرەکەی کە پتر کوردنشین بوون لە هەرێمی جەزیرە دابڕێنران‌و وەك هەرێمێکی سەربەخۆی لێهات (الاعلاق الخطیرة، ٣/٤).

باجرمێ - گەرمیان ناوێکی جوگرافی دێرینەو لە نووسراوە سریانی‌و عەرەبییەکاندا بە باجرمێ، بیتجرمێ، باجرمق هاتووە کە هەر لە وشەی گەرمی کوردییەوە داتاشراوە و پێشگری با - بیتی خراوەتەسەر کە نیشانەی شوێنە لە زمانی سریانیدا بەواتای وڵاتی (گەرم - گەرمیان).

گەرمیان پێکدەهات لە داقوق‌و خنیاساپورو خانیجارو (کەرخینی - کەرکوك)و دەڤەرێکی سەرسنووری نێوان هەردوو هەرێمی جەزیرەو عێراق بوو، زۆربەی کات وەك ولایەتێکی سەربەخۆ وابوو هەرچەند لە رووی کارگێرییەوە سەرەتا سەر بە جەزیرە بوو پاشان لە ئەنجامی هەڵستانەوەو بەهێزبوونی خیلافەی عەباسییەوە لە سەدەی (٦ك/ ١٢ز) خرایە سەر عێراق (المسالك والمالك، ص ٨٥، نزهە القلوب، ص ٨١).

***کوردو کوردستان لە سەردەمی ئومەوی (٤١ - ١٣٢ك/ ٦٦١ - ٧٤٩ز):-**

ئومەوییەکان نەوەی (ئومەیە کوڕی عەبد شەمس)، نزیکەی نەوەت ساڵ (٤١- ١٣٢ك/ ٦٦١ - ٧٤٩ز) خیلافەیان گرتە دەست‌و حوکمی جیهانی ئیسلامییان کرد، معاویە کوڕی ئەبو سوفیان، سەخەر کوڕی ئەلحەرب کوڕی ئومەیە ئامۆزای خەلیفەی کوژراو عوسمان، هەموو شێوازێکی گرتەبەر بۆ ڕکابەرایەتی‌و دژایەتیکردنی خەلیفە عەلی‌و حەسەنی کوڕی سەرئەنجام بە هەرچۆنێك بێت بە زیرەکی‌و زۆرزانی خۆی توانی دەسەڵات بگرێتە دەست‌و دۆستان‌و نەیارانی ناچار بکات بەیعەتی بدەنێ‌و لە مانگی (ذي العقدە ساڵی ٤٠ك / ٦٦٠) - یان لە مانگی (ربیع الاخر یان جمادی الاولی ساڵی ٤١ك/ ٦٦١ز) خۆی بە خەلیفەی موسڵمانان ڕابگەیەنێت و حەسەنیش دەستبەرداری خیلافە بوو (تأریخ خلیفە، ص ٢٤٣، تأریخ الیعقوبی، ٢/ ١٤٩ - ١٥٠، تأریخ الطبري، ٥/ ١٦١ - ١٦٣).

دەوڵەتی ئومەوی لە هەموو ڕوویەکەوە دەوڵەتێکی عەرەبی بوو، والی‌و بەرپرس‌و نوێنەرانی هەموویان لە پیاوانی هۆزە عەرەبەکان بوون، تەنانەت نەیاران‌و بەرهەلستکارانیان لە شیعە وخەواریج‌و بزاڤە چەکدارییەکانی دی هەر لەوان بوون، بە ئاخافتەکی دی هۆزو بنەماڵە عەرەبەکان دروستکەرو بزوێنەری مێژووی ئیسلامی‌و ئاراستەکەری ڕووداوەکانی بوون، سەرچاوە مێژووییەکانیش هەر جەخت لەسەر ئەم ڕاستییە دەکەن‌و تەنها کێشەو ململانێی نێوان دەسەڵاتدارانی ئەمەوی‌و هەڤرکەکانیان یاداشتدەکەن، قەکۆڵەرانی هاوچەرخ‌و ڕۆژهەڵاتناسانیس هاودەنگن لەسەر ناوەنانی بە دەوڵەتی عەرەبیی ئەمەوی.

*** (بەشداریی کورد لە ڕووداوەکان):**

بەدرێژایی سەردەمی ئومەوی لە چوار پێنج ئاماژەی کورت‌و لاوەکی بەولاوە هیچ هەواڵ‌و دەنگوباسێك سەبارەت بە کورد بەرچاو ناکەوێت، ئەوەندە هەیە ئەم ئاماژانە بایی ئەوە دەکەن بێژین کورد هێشتا نەبوونە هۆگرو لایەنگری دەوڵەت‌و خۆیان لە ڕیزی ڕکەبەرانی دەسەڵاتی ئومەوی دەبینییەوە.

لەو دەمانەی خودی خەلیفەی ئومەوی‌و سەرلەشکرو فەرماندە سەربازییەکان سەرقاڵی کپکردنی دەنگی نەیاران‌و لەناوبردنی بزاڤە چەکدارییەکان بوون، دەسەڵاتیان لە چیاکانی کوردستان کزو لاواز بوو، هۆزە کوردەکانیش ناوبەناو بە جموجۆڵ‌و چالاکی ڕادەبوون، ئەم کارانە بە چ پاڵنەرو هۆکارێك بوو بێت لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا هەر بە کردەوەی تێکدان و ئاژاوەگێڕی‌و وێرانکاری لە قەڵەمدراون. (انساب الاشراف، ٩/ ١١٤)

***(هەڵهاتنی خەواریج بۆ دەڤەرە کوردنشینەکان):**

(الخوارج یان الشراە)، سەرەتا بەو کۆمەڵە جەنگاوەرە توندرەوانە دەگوترا کە لایەنگرو هاوسۆزی خەلیفە عەلی بوون، لە میانەی کێشەو ناکۆکی نێوان خەلیفە عەلی‌و مەعاویە، ڕێککەوتن‌و ناوبژییان ڕەتکردەوەو لە ڕیزی سوپای خەلیفە عەلی چوونە دەرەوەو تەکفیری هەردوو لایانکردو ئاڵای (لاحکم الا الله) یان بڵند کردەوە، دواتر بوونە حیزبیکی ئیسلامی بەهێزو خەباتی چەکداریان هەڵبژاردو هەزاران چەکدارو شاسواریان لە خۆکۆکردەوەو بوونە مەترسیەکی ڕاستەقینە لەسەر دەسەڵاتی ئومەوی، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت دووبەرەکیان تێکەوت‌و بەسەر چەند گرووپێکدا کەرتبوون‌و تەکفیری یەکدیان دەکردو کەوتنە وێزەی یەکتر (تأریخ الیعقوبی، ٢/ ١٣١ - ١٣٢، تأریخ الطبري، ٥/ ٧٢ - ٧٦، مروج الذهب، ٣/ ١٣٨).

ئەوان پێیان وابوو خەلیفەی موسڵمانان دەبێت بە ڕاوێژو شورا بهێتە هەڵبژاردن‌و میللەتانی موسڵمان هەموو یەکسانن لە ڕووی ئەرك‌و مافەکانەوەو هەقی هەر موسڵمانێکە یا کۆیلەیەکی ڕەشپێستیش بێت خۆی بۆ پۆستی خەلیفە بەربژێر بکات‌و مەرج نییە عەرەب بێت‌و بەڵکو مەرج‌و پێویستە خوداناس‌و ڕاستگۆو دەستپاك‌و ئیماندار بێت‌و بەدڵی (ڕاوێژکاران - اهل الشوری) بێت (الشهرستاني، الملل‌و والنحل، ، ١/١٧٥، الحمیري، الحور العین، ص ٢٠٠ -٢٠١).

بەڵگەی ڕاشکاو ئاشکرا نیە سەبارەت بە بڵاوبونەوەی هزرو بیروباوەڕی خەواریج لەنێو کورددا لە سەردەمی ئومەوی، دوای ئەوەش لەو دەمانە هێشتا ئیسلام بە قوڵی بەناخی مرۆڤی کورددا ڕۆنەچووبوو، کوردە تازە موسڵمانەکانیش ئەوەندە ئاشنایەتیان لەگەڵ ئایینی نوێ

پەیدا نەکردبووو چەمك و ناوەرۆکیان فەراهەم نەکردبوو تا ئاینزاو بیروباوەری ئەم ئاینە لێکدەنەوەو راستی و ناراستی لێکجودا بکەنەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە چیاو پێدەشتەکانی شارەزوورو جەزیرەو ولورستان بوون بە بەشێك لە گۆرەپانی ئاوالآی شەرو بەرەنگاربوونەوەی نێوان جەنگاوەرانی خەواریج و سوپای ئومەوی، شاسوارانی خەواریج هەر کاتێك ئابلوقەو تەنگاو بکرانایە پەنایان دەبردە بەر ئەو دەڤەرە چۆڵ و نادیارانەی کە لەشکری دەوڵەت بەزەحمەت دەستی پێرا دەگەیشت.

ئەگەر هاریکاریی گرووپەکانی خەواریجیشیان کردبێت ئەوا هۆکارو پاڵنەرەکەی ئابووری بوو نەك ئایینی و مەزهەبی، لێرە مەبەست لە هۆکاری ئابووری خۆدەبازکردنە لە دانی موڵکانەو سەرانە بە دەوڵەتی ئومەوی کە بەهۆی شەڕو کوشتارە ناوخۆییەکانەوە هەردەم پێویستی بەدابینکردنی پارە هەبوو، موڵکانەو سەرانەش چاووگی بنەرەتیی داهاتی دەوڵەت بوون،

سالح کوری مسرح ئەلتەمیمی پیاوێکی خوداپەرست و ئیمانداربوو، خەڵکیی کۆدە کردەوەو قورئانی بۆ دەخوێندن، لە ئاکامی ستەمکاریی ئومەوییەکان داوای لەلایەنگرانی کرد بێنەدەنگ و لە ساڵی (٧٦ك/ ٦٩٥)ز بەسەدو بیست کەسێکەوە لە خاکی مووسڵ و داراو جەزیرە دەرکەوت و خەڵکانێکی زۆر لە دەوری کۆبوونەوە، تا بووە یەکێك لە بزاڤە بەهێزەکانی خەواریج لە جەزیرەو شارەزوور، دوای کوژرانی سالح لە شەرێکدا لەگەڵ سوپای ئومەوی لە هەمان ساڵدا شەبیب کوری یەزید ئەلخاریجی جێگەی گرتەوە، ئەمیش گوندو چیاو دەشتەکانی جەزیرەو شارەزوورو داقوق و خانەقین و ئازەربیجانی کردە گۆرەپانی چالاکییەکانی، سروشتی بزاڤی خەواریج وای دەخواست لە شوێنێکدا مۆڵنەخۆن و نایاندەویست بارەگای جێگیریان هەبێت و خۆیان لە بەرەنگاربوونەوەی راستەوخۆی لەشکری ئومەوی دەپاراست و بەردەوام جێگۆرکێیان دەکرد.

لەدوا ساڵەکانی سەردەمی ئومەوی، بەهۆی لاوازی و ناتەبایی سەرانی دەوڵەت و ئەو قەیرانە سیاسیەی وا دووچاری دەسەڵات هاتبوو خەواریج زیندووبوونەوەو سەرلەنوێ خۆیان رێکخستەوەو لە جاران توندتر بەزنجیرەیەك بزاڤ و جموجۆڵی لەشکری هەڵستان.

* (کوردو بانگەشەی عەباسی):

عەباسییەکان نەوەی ئەلعەباس کوری عەبدولموتەلیب مامی پێغەمبەرن (د.خ)، لە دەورووبەری ساڵی (١٠٠ك/ ٧١٩ز) بانگەشەی عەباسی دەرکەوت و بارەگای یەکەمیان باژێری سلیمە بوو لە وڵاتی شام.

عەباسییەکان دەیانویست لە رێگای رێکخستنی نهێنییەوە خۆیان سازبدەن و رێگەخۆش بکەن بۆ بەرپاکردنی شۆرشێك دژ بە خیلافەی ئومەوی، ئەوان بەو پێیەی نەوەی هاشمن و پسمامی پێغەمبەرن خۆیان بە شایستەو موستەحەق دەزانی ببنە جێگری پێغەمبەرو خەلیفەی موسڵمانان و دروشمی (الرضا من ال محمد) یان بلند کردەوە،

بانگخوازانیان بە دەڤەرو هەرێمەکاندا بڵاوکردەوەو سەرەتا لە هەرێمی خوراسانەوە دەستیان پێکرد، ئەم بانگخوازانە بە پۆشاکی بازرگانان و حاجیانەوە بە شێوەیەکی نهێنی ناوچە بە ناوچەو باژێر بە باژێرو گوند بە گوند دەگەران لەپێناو هاندانی خەڵکی و نەخاسمە میللەتانی مەوالی دژ بە ئومەوییەکان و خستنەرووی هەڵوێستی نابەجێ و هەڵسوکەوتی ستەمکارانەی خەلیفەکانی ئومەوی و دەرچوونیان لە رێبازی دروستی پێغەمبەر (د.خ) و هەڤالآنی، هەروەها روونکردنەوەو ئاشکراکردنی سیاسەت و بەرنامەی بانگەشەی عەباسی و گرنگی و پێویستیی بەیعەتدان بە رێبەری یەکەمیان (الامام محمد بن علی بن عبدالله بن العباس بن عبدالطلب) (م١٢٤ك/ ٧٤٢ز) و دوای ئەویش بە کورە گەورەکەی (ابراهیم الامام) (م ١٣٢ك/ ٧٤٩ز)، بەم شێوەیە لە کارو چالاکی بەردەوامبوون تا جەماوەرێکی بێ شومار لە عەرەب و مەوالی چوونە ریزیانەوەو قەناعەتیان بە دروشم و بەرنامەکەیان هێنا، دوای پتر لە سی ساڵ خەبات و کۆششی نهێنی و بە بەرنامە شیان لە ساڵی (١٣٢ك/ ٧٤٩ز) دەوڵەتی ئومەوی بروخێن و دامەزراندنی خیلافەی عەباسی رابگەیەنن[٣].

لە راستیدا زانیاری ئەوتۆ نیە دەربارەی بزاڤ و جموجۆڵی بانگخوازە عەباسییەکان لە نێو کوردا لە بەر ئەوەی ئەوان چالاکی و هاتنوچوونیان بە رەنگێکی هەتا بێژی نهێنی بوو، وەلێ ئەبو موسلیم عبدولرەحمان ئەلخوراسانی بە یەکێك لە رێبەرانی بانگەشەی عەباسی دادەنرێت و کۆڵەکەیەکی سەرەکی بانگەشەکە بوو، هەر لە سەرەتاوە پەیوەندی بە (الامام محمد بن علی)یەوە کردو بەیعەتی پێدا، ئەویش هەر قەناعەتی بە دڵسۆزی و لێوەشاوەیی ئەبو موسلیم هێناو ئومێدی سەرکەوتنی بانگەشەکەی تێدا بەدیکرد.

*(کورد لە زەردەشتییەوە بۆ ئیسلام):

راستییەکی بەڵگەنەویستە کە بڵاوبونەوەی ئیسلام لە کوردستانداو بە موسڵمانبوونی کورد بە خاڵێکی وەرچەرخانی هەمەلایەن و هەرەمەزن دادەنرێت لە دیرۆکی کوردا ولە هەموو بوارەکانی کۆمەڵایەتی و ئایینی و سیاسی و رۆشنبیریی جڤاکی کوردەواریدا رەنگیدایەوە، دەسەڵات وفەرمانرەوایی لە فارسیە ساسانییەکان و رۆمە بیزەنتییەکانەوە گوێزرایەوە بۆ دەستی عەرەبە موسڵمانەکان، مزگەوت و حوجرەکان جێگەی ئاگر خانەو پەرستگاکانیان گرتەوە، لە ئەنجامدانی ئەرکە ئایینییەکان و رێوەسمەکانیدا لە جیاتی پیرو موغ و قەشە، لە سەرەتا مەلاو فەقێ و درەنگتریش شێخ و سۆڤ رێبەری خەڵکیان دەکردو رێگای راستی خوداناسینیان نیشاندەدان، بەڵام ئەم وەرچەرخانە کتوپڕ بەرپانەبووو لە شەوو رۆژێکدا روویدا، بەڵکو سەدان ساڵی خایاند تا زۆربەی هەرەزۆری کورد ببنە موسڵمان.

گومانی تێدا نییە سروشت و تۆبۆگرافیاو هەڵکەوتەی جوگرافیی کوردستان هەر لە دێرزەمانەوە گەلێك جاران رۆڵی سەرەکی و یەکلاکەرەوەی گێراوە لە چێکردن و ئاراستەکردنی

مێژووی کورددا، هەڵەتو زەنوێرو چیا سەختو بڵندەکانی کوردستان هەردەم پارێزەرو نیگەهبانی خۆرسکی زمانو کەلەپوورو دابونەریتو جلوبەرگی کوردەواری بوون و لەمپەرو بەربەستی بەردەم تەوژمو کاریگەرییە هەمەچەشنە بیانییەکان بوونو کارێکی وایانکرد میللەتی کورد پێگیرو گوێڕایەڵی بیروباوەڕی دێرینی خۆیان بن، مۆرکو تایبەتمەندی خۆیان تارادەیەکی زۆر بپارێزن.

بەڵگەو ئاماژە مێژووییەکانو لێدوانی گەڕۆکەکان دەیسەلمێنن ڕێژەیەك لە کوردو خەڵکی کوردستان بەلای کەمەوە تا سەدەی (٣ك/ ٩ز) لەسەر ئاییینی زەردەشتی مابوونەوە.

* (کوردو کوردستان لە سەردەمی عەباسیی یەکەمو دووەم) (١٣٢ - ٣٣٤ك/ ٧٤٩ - ٩٤٦ز)

بانگەشەی عەباسی سەرئەنجام سەرکەوتنی بەدەستهێناو بنەماڵەی عەباسی جێگەی بنەماڵەی ئومەوییان گرتەوەو خیلافەی عەباسییان دامەزراند، خەلیفەی دووەمم ئەبو جەعفەر ئەلمەنسوور لە ساڵی (١٤٥ك/ ٧٦٢ز) شاری بەغدای بنیادناو کردیە پایتەختو بەمەش عێراق کرایە ناوەندی خیلافەی نوێ.

سەردەمی عەباسی یەکەم (١٣٢ - ٢٤٧ك/ ٧٤٩ - ٨٦١ز) سەردەمی زێڕینی خیلافەی عەباسی بوو چونکە بە قۆناغی گەشەکردنو پێگەیشتن یان قۆناغی لاوێتی ڕادەبووری، خەلیفەکان بەتایبەت (ابو جعفر المنصورو المهدیو هارون الرشیدو المامونو المعتصم) کەسانی بەهێزو کارامە بوونو شایەنی ئەو پۆستە بوونو خۆیان تاکە فەرمانڕەواو سەرچاوەی بڕیاربوون، خیلافە شکۆو هەیبەتی خۆی هەبوو.

لەگەڵ ئەم ڕاستییەشدا عەباسییەکان بە چەشنی ئومەوییەکان هەر لە سەرەتاوە گیرۆدەی گەلێك ئاستەنگو کۆسپ بوونو نەشیان ئاریشەی سیستەمی خیلافە چارەسەربکەن، ئەم پۆستە هەر بە میراتگری بەڕێوەچوو و پەیوەستکرا بە ئەندامانی بنەماڵەی دەسەڵاتدارەوە، ئەمەش بووە پاڵنەرێکی سەربار بۆ سەرهەڵدانەوەی بزاڤەکانی شیعەو خەواریج لە جاران بە گوڕترو لە ئاستێکی بەرفراوانتر، ڕێبەرانی ئەم بزاڤە ئامادەنەبوون دەسەڵاتی عەباسی بە ڕەواو شەرعی بناسن، هەردوولایان بە یەك چاو تەماشای ئومەوییەکانو عەباسییەکانیان دەکردو لەم ڕوانگەیەوە درێژەیان بە چالاکیو خەباتی سیاسیو سەربازی داو زنجیرەیەك شۆڕشیان بەرپاکرد، لەلایەکی ترەوە میللەتانی نا عەرەب واتە مەوالی پاش چەند ساڵێکی کەم لە دامەزراندنی خیلافەی نوێ زنجیرەیەك بزاڤو شۆڕشوسەرهەڵدانیان بەرپاکرد کە دیارتریان شۆڕشی بابەکی خوڕەمییە (٢٠١ - ٢٢٣ك/ ٨١٧ - ٨٣٨ز)

بە مردنی خەلیفە موعتەسەم لە ساڵی (٢٢٧ ك - ٨٤٢ز) خیلافەی عەباسی بەرەبەرە ڕووەو لاوازیو نابوتبوون داشکاو کار بەوە گەیشت خودی خەلیفە بەهاو شکۆی ئەوتۆی نەماو بالادەستیو سەرفەرازیی پوکانەوەو بڕیارو فەرمانەکانی ئەوەندە بڕیان ناکردو دەسەڵاتی بەسەر کەسدا ناشکا، تەنها وەك هێما قوتکرابۆوەو ئەو سەرکردە تورکانەی کەوا خەلیفە موعتەسەم لە ناوچە تورکنشینەکانی ڕۆژهەڵاتەوە هێنابوونیو پشتی پێدەبەستن بۆ شەڕی نەیارانی بە ویستی خۆیان گەمەیان بە خەلیفەو خیلافە دەکردو کەنگی ئارەزوویان بکردایە خەلیفەیان لە پۆستەکەی بەلاوە دەناو یەکێکی دییان لە جێگەی دادەنیشاندو بۆ خۆیان سەرپشکبوون لە فەرمانڕەواییو بەڕێوەبردنداو بە بەرژەوەندی خۆیان کاروبارەکانیان هەڵدەسووڕاندو ئەم ڕەوشەش بە شێوەیەکی زەق تا ساڵی (٣٣٤ك/ ٩٤٦ز) بێجگە لە سەردەمی خەلیفە (المعتضد) (٢٧٩ - ٢٨٩ك/ ٨٩٢- ٩٠٢ز) درێژەی کێشاو کارێکی وایکرد کە دەسەڵاتی ناوەندی لە ئەوپەڕی سستیو خامۆشی دابێت بەسەرهەرێمو ولایەتەکاندا لەوانەش کوردستانو سەردارو سەرۆك هۆزە کوردەکان بەوێنەی عەرەبەکان لەم دۆزە سوودمەند بوونو نیمچە سەربەخۆییەکیان دەستەبەرکرد وەك لە سەر چاوەیەکدا هاتووە (الاعراب و الاکراد عائثون)، (النبراس، ص ٩٠ - ٩١).

* (بزاڤو چالاکیی چەکداری)

لەسەردەمی عەباسیدا، هۆزە کوردەکان لە زۆربەی دەڤەرەکانی کوردستان بە هۆکارو پاڵنەری جۆربەجۆردا بە زنجیرەیەك چالاکیو جموجۆڵی سەربازی ڕابوون دژ بە کاربەدەستانو دامودەزگاکانی دەوڵەت، لە بزاڤو هەڵگەڕانەوەو یاخیبوونو باجنەدانو ڕێگریو داڵدەدانی نەیارانو بەرهەڵستکارانی دەسەڵاتی ناوەندی.

هەرچی کاری تێکدانو وێرانکاریو ئاشووبنانەوە هەیە بیخەنە پاڵ کوردو بە گێرەشێوێنو تاڵانکەر ناوزەدیان بکەن[٤].

ئەم کارو چالاکییە سەربازییانەی کورد دژ بە دەوڵەت هۆکارێکی بنەڕەتی بوو بۆ بۆ ئەوەی کورد لە دیدی چڤاکی ئیسلامیو چینی دەسەڵاتدارانەوە خەوشدار بکرێتو بە چاوێکی دوژمنکارانەو سووك تەماشا بکرێتو ئەم هەڵوێستە نەرێنییە لە ئەدەبیاتی عەرەبی ئیسلامی بە زەقی ڕەنگبداتەوە، بەو پێیەی ئەدەب ئاوێنەی واقیعە.

لە ژێدەرە مێژووییەکانو یاداشتی گەڕۆكو جوگرافیوانان، بەرهەمە ئەدەبیو مەعریفییەکان، چیرۆكو داستانو بەسەرهاتەکان، دیوانی شاعیران، تەنانەت لە سەرچاوە فیقهییەکانو ئەوانەی دەربارەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ)و شرۆڤەکردنو لێکدانەوەی قورئان (کتب الحدیث و التفسیر) نووسراون، دەیان جار کورد بە دز، ڕێگر، نەزان، گەمژەو ساویلکە، تاڵانکەرو وێرانکەر ناوبراوەو بە چەندین پەندو قسەی نەستەقو سەرگوزەشتەو چیرۆك گوزارشت لە لاساریو ڕێگریی کوردان کراوە[٥].

*** (بزاڤەكانی سەردەمی خەلیفە المقتدر ٢٩٥ - ٣٢٠ك/ ٩٠٨ - ٩٣٢ز)**

(خەلیفە المقتدر) تەواو بە پێچەوانەی هەردوو خەلیفەی پێش خۆی (المعتضد والمكتفی) كەسایەتییەكی لاواز و بێ دەسەلات بوو، ئەو دەمەی پۆستی خیلافەی پێسپێردرا هەرزەكارێكی سێزدە ساڵان بوو، كاروباری سیاسەتی دەوڵەتی بەدەست سەركردە سەربازییە توركەكان‌و دارودەستەی دەرباری خەلیفەوە بوو، خیلافە جارێكی تر دووچاری بێ هێزی‌و نوشستی هاتەوە (فاروق عمر، الخلافە العباسیە، ٢/ ٥٧ - ٥٨).

گومانی تێدانییە بێدەسەلاتیی خەلیفەو لاوازیی دەسەلاتی ناوەندی راستەوخۆ دەبێتە مایەی ئەوەی كاروباری هەرێمەكان فەرامۆشبكرێت‌و گەندەڵی دارایی‌و رێڤەبەری تەشەنەبكات، ئەم دیاردەیەش شارەزوورو هەرێمەكانی تری كوردستانی گرتەوەو لە بزاڤو یاخیبوونی هۆزە كوردەكان رەنگیدایەوە، شارەزوور بۆ ماوەی بیست ساڵ (٢٩٧ - ٣١٧ك/ ٩١٠ - ٩٢٩ز) لە خیلافە یاخیبووو باج‌و خەراج ناهاتە ناردن بۆ بەغدا، خەلیفە بەیناوبەین لەشكری دەناردە سەر شارەزوور تا دامودەزگای دارایی دەوڵەتی بۆ بگەرێنێتەوە، لە ساڵی (٣٠٧ك/ ٩١٩ز) سەركردەیەكی بە ناوی (بنی بن نفیس) ناردە سەر شارەزوور تا كۆتایی بەسەرپێچی‌و یاخیبوونی كوردان بێنێت، وەلێ نەیتوانی ئەركەكەی بە ئەنجام بگەیەنێت، هەرچەند خەلیفە هاریكاری‌و پشتیوانی سەربازیشی بۆ رەوانەكردو گەمارۆی شارەزووریاندا بێ ئەوەی سەر كەوتووبن (الكامل، ٦/ ٢٩٣).

***(رۆڵ‌و بەشداریی لە بزاڤە ئاینییە - سیاسییە بەرهەڵستەكان)**

بەدرێژایی دووسەد ساڵی یەكەمی سەردەمی عەباسی، دەیان جار ناوو دەنگوباسی جموجۆڵی هۆزو كەسایەتییە كوردەكان لە ژێدەرو سەرچاوە مێژووییەكان تۆماركراوەو لایەنێك لەلایەنەكانی ژیان‌و سەربوردەو هەڵوێستیان‌و رەوش‌و هەلومەرجی وڵاتەكەیان روونكراوەتەوە، بە لێوردبوونەوە لێیان دەگەینە ئەو قەناعەتەی بەدڵنیاییەوە بڵێین كە كورد ئەو دەمانە هێشتا نەبووبوو بەشێك لە جڤاكی ئیسلامی‌و بە تەواوەتی‌و گشتگیری ئاوێتەو تێكەڵی ژیانی سیاسی ئیسلامی نەبووبوو، بەڵكو پتر هەوادارو هاریكاری‌و پشتیوانی هێزو بزاڤو رەوتە نەیارەكانی دەوڵەتی ناوەندی بوو، ئەمە سەرباری راگەیاندن‌و ئەنجامدانی زنجیرەیەك چالاكیی سەربازی دژ بە والیی‌و بەرپرسانی دەوڵەت لە ناوچە جۆرە بەجۆرەكانی كوردستان.

*** (لە بزاڤەكانی خەواریج):**

بزاڤەكانی خەواریج بە لەناوچوونی دەوڵەتی ئومەوی نەبرایەوە بەڵكو لە سەردەمی عەباسی پتر گەشەیانكردو مەترسی زیاتریان خستەسەر خیلافە، هزری خەواریج وێرای عەرەب لەناو نەتەوە موسڵمانەكانی دی پەخشكرا، ئەوان خیلافەی عەباسیشیان بە ناشەرعی‌و نارەوا دەزانی‌و هەر بەو چاوە لێیان دەروانی كە پێشتر خیلافەی ئومەوییان پێدەبینی، لەلایەكی دیەوە توند و تیژیی جێگران‌و والیانی عەباسی‌و زۆرداری‌و بێدادیی باجگەران‌و بەرپرسانی دارایی‌و كارگێریی دەوڵەت بوونە مایەی ئەوەی كە خەڵكی لە زۆربەی هەرێمەكان‌و بەتایبەت لە هەردوو هەرێمی جەزیرەو ئازەربیجان بدەنە پاڵ بزاڤەكانی الخوارج‌و دوژمنداریی دەوڵەت بكەن (الخلافة العباسية، ٢/ ٤٦).

شارەزوورو ناوچەكانی دەورووبەری مووسڵ‌و باكوورو رۆژهەڵاتی هەرێمی جەزیرە لە پاڵ هەبونی چەند هۆزێكی عەرەب لە ناوچەكەدا هۆكارێكی دی بوون كە ئەم ناوچانە ببنە مەیدانی چالاكی‌و رایەڵەی سوارچاكانی الخوارج، وەكو زانراوە سەرۆك هۆزەكان هەر گاڤ ئارەزوویان دەكرد گوێرایەڵی دەسەلاتی ناوەندی نەبن‌و ئەمیش بە بەرژەوەندی سەركردەكانی خەواریج دەشكایەوە.

هاوكات لەگەڵ بزاڤی (مساور بن عبدالحميد)دا كوردە یەعقوبییەكانیش بە بزاڤێك رابوون‌و بە (اليعقوبيه الشراه) ناوبراون‌و بزاڤەكەیان ماوەی پازدە ساڵی خایاند، لە راستیدا لقێك بوون لە بزاڤی مساورو هەندێك لە كوردە یەعقوبییەكان تا مردنی (مساور الشاري) هەر لە گەڵیدا مانەوە.

سەرەتای بزاڤی كوردە یەعقوبییەكان روون نییە، ئەوەندە هەیە سەركردە (مسرور البلخي) لە ساڵی (٢٥٨ك/ ٨٧٢ز) هێرشیكردە سەریان‌و بە گوێرەی ئاخەفتنی (الطبري) ژمارەیەكی لێكوشتن، پاش هەشت ساڵ‌و لە ساڵی (٢٦٦ك/ ٨٨٠ز) سوپایەكی تری عەباسی بەسەركردایەتی سەركردەی توركی (اسحاق بن كنداج) هێرشیكردە سەریان‌و ماڵ‌و سامانی تالانكردن، بەڵام ئەم هێرشانە نەبوونە هۆی لەناوبردنی ئەم بزاڤە، بەڵكو لایەنی كەم تا ساڵی (٢٧٣ك/ ٨٨٦ز) هەر بەردەوام بوو، لەم ساڵەدا كوردە یەعقوبییەكان زیانێكی قورسیان بەو لەشكرە عەباسییە گەیاند كە لە مووسڵەوە بۆ باج وەرگرتن هاتبوونە ناوچەی مێرگ‌و سوق الاحد (دەڤەری مرێبا‌و قەسرۆك) و نزیكەی هەشت سەد (؟) كەسیان لێكوشتن‌و لەمە بەدواوە هیچ زانیارییەكی تر دەربارەی كوردە یەعقوبییەكان لە بەردەست نییە (تاريخ الطبري ٩/ ٤٩٠، ٥٥١، الكامل، ٥/ ٦٨٧، ٦/ ٤٨، ١١٢- ١١٣).

*** (كوردستان لە سەردەمی بوەیهی ٣٣٤- ٤٤٧ك/ ٩٤٦- ١٠٥٥ز) (رۆژگاری میرنشینە كوردەكان)**

بوەیهییەكان لە بنەماڵەیەكی ساكارو دەستكورتی میللەتی دەیلەمن، دەیلەمیش میللەتێكی دێرینی ئێرانین‌و نیشتمانیان هەر بە وڵاتی دەیلەم دەناسرا كە دەكەوتە باشووری رۆژئاوای دەریای خەزەر - قەزوینەوە، هاوسنوورو هاوكەشوهەوای هەرێمی چیاكانەوە بەشێوەیەكی گشتی شوێنێكی شاخاوی سەختە.

لە ئاكامی بێهێزی خیلافەی عەباسی، لە دەستپێكی سەدەی (٤ك/ ١٠ز) ژمارەیەك میرو سەركردەی سەربازی سەربەخۆ لە هەرێمەكانی چیاكان‌و دەیلەم‌و ئازەربیجان دەركەوتن، عەلی‌و حەسەن‌و ئەحمەد كورانی بوەیە ژیانی

سیاسییان لە ناوچەکە وەك سەربازی سەرەڕۆو کرێگرتە لە خزمەت ئەو سەرکردانە دەستپێکرد، سەرەتا خزمەتی سەرکردەیەکی دەیلەمیان دەکرد بەناوی ماکانی کوڕی کاکی، پاش شکانی ماکان لەسەر دەستی سەرکردەیەکی تری دەیلەمی بەناوی مرداویجی کوڕی زەیار، ڕیزی ماکانیان بەجێهێشت و پەیوەندییان بە مردایجەوە کرد، دوای ئەوەی مرداویج توانی دەستبەسەر هەرێمەکانی گورگان و تەبەرستان و قەزوێن و زنجان و بەشێك لە هەرێمی چیاکاندا بگرێت.

کوڕانی بوەیە هەر زوو زیرەکی و لێهاتویی خۆیان خستەڕووو بوونە جێگەی باوەڕو متمانەی مرداویج و ئەویش کارو بەرپرسیارەتی بۆ دابینکردن و برا گەورەکەیان عەلیی کردە والیی کەرەج، ئەوەندەی پێنەچوو عەلی و براکانی لە چوارچێوەی دەسەڵاتی مرداویج چوونە دەرەوەو سەرکەوتووانە توانیان لە ماوەیەکی کورتدا قەوارەیەك بۆ خۆیان پێکەوەبنێن، عەلی کوڕی بوەیە لە ماوەی ساڵانی (٣٢١ – ٣٢٢ك/ ٩٣٣– ٩٣٤ز) ئەسفەهان و ئەرجان و شیرازی گرت، هاوکات ئەحمەدی کوڕی بوەیهیش دەستیگرت بەسەر کرماندا (تجارب الأمم)، (٥/ ١٥٨ – ١٥٩، ١٦٨، الکامل، (٦/ ٣٨٥ – ٣٩٠).

لە ساڵی (٣٢٣ك/ ٩٣٥ز) مرداویج بە دەستی ئەو سەربازە تورکانەی کەوا لە خزمەتیدابوون کوژرا، ئەم ڕووداوەش تەواو لە بەرژەوەندی بوەیهییەکاندا بووو ڕێگای بۆ خۆشکردن زیاتر دەسەڵاتی خۆیان بەرفراوان بکەن و شارو ناوچەی تر بگرن و بەرەبەرە بەرەو بەغدای پایتەخت هەنگاو بنێن، لە ساڵی (٣٢٦ك/ ٩٣٨ز) ئەحمەدی کوڕی بوەیە (الاهواز – خوزستانی) هاوسنووری عێراقیشی گرت، دوای دوو ساڵ براکەی تریان حەسەنی کوڕی بوەیە دەستیگرت بەسەر شاری واسط و دواتر هەردوو شاری (ئەسفەهان و ڕەی) گیران، ئەمە لە کاتێکدا خەلیفەی عەباسی هیچ ویست و دەسەڵاتی بەدەستەوە نەمابوو خیلافە لە ڕەوشێکی گەلێك ئاڵۆزو نائارامدا بوو، کێشەو ململانێی نێوان سەرکردە تورکەکان و میری میران و دەسەڵاتداران تا دەهات قووڵتر دەبووەوە بە ئارەزوی خۆیان گەمەیان بە چارەنووسی خیلافە دەکرد، لە ساڵی (٣٣٢ك/ ٩٤٤ز) سەرکردەی ناوداری تورکی تۆزۆن هەڵسا بە چاودەرهێنانی خەلیفە (المتقی) (٣٢٩ – ٣٣٣ك/ ٩٤١ – ٩٤٥ز) و کورێکی خەلیفە (المتکفی) هێنا و کردی بە خەلیفەو نازناوی (المستکفی باللە)ی لێنرا، بوەیهییەکانیش لای خۆیانەوە بەرەبەرە لە بەغدای پایتەخت نزیکدەبوونەوە، لە ساڵی (٣٣٤ ك/ ٩٤٦ز) تۆزۆنی تورکی مردو (ابو جعفری کوڕی شێرزاد – ابن شیرزاد) لە شوێنی ئەو کرایە میری میران و باروودۆخەکە پتر ئاڵۆز بوو، کار بەوە گەیشت کەس نەدەشیا کاروبارەکان بەڕێوەبباتو هێمنی بۆ بەغدای پایتەخت بگەڕێنێتەوە، هەر بۆیە (یەنال کۆشە) کە لەلایەن (ابن شیرزاد)ەوە بە بەرپرسی واسط دانرابوو پەیوەندی بە ئەحمەدی کوڕی بوەیهییەوە کردو ملکەچی و پشتیوانی خۆی بۆ ڕاگەیاندو ئەویش ڕووەو بەغدا بەڕێکەوت و خەلیفە (المستکفی) شادمانی خۆی دەربڕی بە گەیشتنی ئەحمەدو ڕەزامەندی پیشاندا کە بە ئاشتی بێتە ناو بەغداوەو نازناوی (معز الدولة) ی پێبەخشی، هەروەها نازناوی (عمادالدولة)و (رکن الدولة) ی بەخشی بە هەردوو براکەی عەلی و حەسەن و ڕەزامەندی نیشاندا نازناوو کونیەیان لەسەر دراوی خیلافە لە دینارو درهەم بنەخشێنرێت[٦].

لێرە بەدواوە بوەیهییەکان بوونە فەرمانڕەوای ڕاستەقینەی خیلافەو خەلیفەی عەباسییان تەنها وەك هێمایەك هێشتەوەو بۆ ماوەی پتر لە سەدەیەك (٣٣٤ – ٤٤٧ك/ ٩٤٦ – ١٠٥٥ز) حوکمیانکردو ئەو ماوەیە بە سەردەمی بوەیهی دەناسرێت[٧].

بوەیهییەکان هەر لە سەرەتاوە، درکیان بەوە کرد کە ناتوانن بە شێوەیەکی ڕاستەخۆ ناوچەی شاخاوێکانی کوردستان بەڕێوە ببەن و بەرێگەی سەربازی دەسەڵاتی خۆیان بچەسپێنن، لەبەر ئەوەی کوردستان – وەك زانراوە – وڵاتێکی شاخاوی سەختە، هیچ داگیر بکات، بەڵکو هەر گاڤ بەوە ڕازیدەبوون کە ساڵانە باج و خەراج لە کوردەکان وەربگرن، شەرەفخانی بەدلیسی (م ١٠١٠ك/ ١٦٠١ز) کە خۆی لە بنەماڵەی میرانی بەدلیسە هەستی بەم ڕاستییە کردەوەو بەراشکاوی ئاماژەی پێداوە (شرفنامە، ص ٦٠)، خانەکانی مەغۆل بە هەموو زەبروزەنگیانەوە هەرچەند کردیان نەشیان کوردەکان ملکەچ و دەستەمۆ بکەن و کوردستان کۆنترۆڵ بکەن، ناچار ملیانداو پەیرەوی ئەم سیاسەتەیان کرد (مسالك الأبصار)، (٣/ ٢٦٣ – ٢٦٤).

رکن الدولة حەسەنی بوەیهی پتر لە براکانی شارەزای باروودۆخی تایبەتی کوردستان بوو، لە نزیکەوە ئاگادرای میرو قەڵادارە کوردکان بوو، هەوڵیدەدا چاو لە چالاکی و زێدەگاڤیان بپۆشێ، ئەگەر پێی بگوترایە کوردەکان ڕێگایان بڕی و مەرو ماڵاتیان تاڵانکرد، یەکسەر بەرسفێدەدایەوە (قەیدی ناکا کوردەکان پێویستیان بە خواردنە)، هەردەم دووپاتیدەکردەوە (دەوڵەتەکەم بەستراوە بە دەوڵەتی کوردانەوە – دولتی مقرونە بدولە الاکراد)، (تجارب الأمم، ٥/ ٣٧٧ – ٣٧٨).

لەبەر ئەم هۆکارەو چەند هۆکارێکی بابەتی و مێژوویی دیکە کە وەك دەرئەنجامێکی گۆرانکارییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی جیهانی ئیسلامی هاتنە گـۆرێ، لە سەرەتای سەردەمی بوەیهییەوە ژمارەیەك میرنشینی گەورەو بەهێز لە ناوچەی جۆربەجۆرەکانی کوردستان دەرکەوتن کە هەندێکیان شێوەیەکی پێگەیشتوو کامڵبووی قەوارە سیاسییەکانی پێش سەردەمی بوەیهی بوون.

لە لایەکی ترەوە لە پاش نەمانی سەردەمانی سەروەری و بەهێزی خیلافە، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای جیهانی ئیسلامیدا دەگمەن هەرێمێك هەبوو کە قەوارەیەك یان زیاتری سەربەخۆو نیمچە سەربەخۆی لێنەبێت یان هۆزێکی باڵادەست دەستی بەسەردانەگرتبێت، سیستەمی گونجاوو لەباری حوکمکردن و بەڕێوەبردن وایدەخواست پتر لە هێزو قەوارەیەکی سیاسی هەبێت و وەك پێداویستییەکی ئەو ڕەوشە نوێیەی کە جیهانی ئیسلامی پێیدا تێدەپەڕی.

میرە کوردەکان کاروباری زۆربەی ناوچەکانی کوردستانیان بەڕێوەدەبرد، خاوەنی دامودەزگا سیاسی،

سەربازی، دارایی، کارگێڕی، دادوەری خۆیان بوون، خەلیفەی عەباسی دانیدەنا بە هەموویان، میرەکان دراویان بەناوی خۆیانەوە لێدەدا پاش لێدانی ناوی خەلیفەی عەباسیو ئەمیری بوەیهی لەسەر دراوەکە، لە خوتبەی ڕۆژانی هەینیدا ناویان لە دوای ناوی خەلیفەوە دەهاتو دوعایان بۆ دەکرا[8].

لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستییانە دەشێین بڵێین میرنشینەکانی کوردستان لە سەردەمی بوەیهیدا تەواو پێگەیشتنو تا ڕادەیەك خاوەن ویستی سیاسی خۆیان بوون، بە تایبەت میرنشینی مەروانی لە هەرێمی جەزیرە کە لەم لایەنەوە هیچ کەمتر نەبوو لەو میرنشینانەی وا لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی دەرکەوتن.

بەڵام مەخابن هیچ کامێکیان خەمی زمانو فەرهەنگو کلتووری کوردییان نەخواردو زیندووکردنەوەو خزمەتکردنی ئەدەبو کەلەپوری نەتەوەکەیان هەر بەخەیاڵدا نەدەهاتو هیچ کاریگەرییەکیان نەبوو لە بوژاندنەوەو پێشخستنی ڕووناکبیریو هۆشیاریی نەتەوەییدا، بەڵکو گوێیان بە تۆمار کردنی دیرۆکی خۆیانیش نەداوو ئەم لایەنەیان تەواو فەراموشکرد، ماڵی مێژوونووسانی غەیرە کورد ئاوابێت لە وێنەی:

" الطبريو مسكويهو الروذراوري – فارس.

" هلال الصابئو غرس النعمەی کوڕی – صابئە.

" الفارقي وابن الاثيرو وابن المستوفی – عەرەب.

" سبط ابن الجوزي والذهبي – تورك.. هتد کە هەرچۆنێك بێت و بە چ هۆکارێك بووبێت چمکێکی مێژووی کوردیان تۆمار کردەوە.

* (دەرکەوتنی هۆزی هەزبانی):

هەزبانی – الهذبانية[9] مەزنترینو بەربڵاوترین هۆزی کوردە بەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاستو بەسەر چەند خێڵو تیرەو ماڵباتێکدا دابەشدەبوو، هەرچەند تەنها ناوی دوو لە تیرەکانی ئاشکرایە:

"مارانی – المارانیە: نیشتەجێی ناوچەی مێرگو کەناری زێی مەزنو ناوچەکانی نێوان مووسڵو هەولێر بوون (المنذري، التكمله، ص٢/ ١٥٦).

" ڕەوادی – ڕەوەندی کەوا دیارە کۆچەرو نیمچە کۆچەر بوونو پاشان لە ناوچەکانی ئورمێو شنۆو سەلماسو دوێن نیشتەجێبون.

پانتاییەکی بەرفراوانی هەردوو هەرێمی جەزیرەو ئازەربیجان، نیشتمانو هەواری خێڵو تیرەکانی هۆزی هەزبانی بوو، زستانان لە هەولێرو دەورووبەریو پێدەشتەکانی نێوان هەردوو زێ دەگیرسانەوە، وێرای ناوچە دەشتاییەکانی شنۆو ئورمێو نەریزو سەلماس، هاوینانیش ڕەوەندەکانی هەزبانی بەرەو کوێستانەکانی چیاکانی ڕۆژهەڵاتی هەولێرو ئازەربیجان هەڵدەکشان.

بۆ یەکەمجار هەزبانییەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی (٣ك/ ٩ز) دەرکەوتن کاتێك لە ساڵی (٢٩٣ك/ ٩٠٦ز) لە (ابو الهيجاء الحمداني) هەڵگەڕانەوە، بەڵام دەرکەوتنی ڕاستەقینەیان لە مێژوودا دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی پاشتر، کاتێك چەند بنەماڵەیەکی دەسەڵاتداریان پایەداربوونو حوکمی ژمارەیەك باژێرو شارۆچکەیان گرتەدەستو سەرەتا وەك نیمچە میرنشین دەرکەوتن، لەوانە:

" ماڵباتی ابو الهيجاء موسك لە قەڵای هەولێرو دەورووبەری.

"ماڵباتی ابو الهيجاء ی کوڕی ڕەواد لە دەورووبەری نەریزو تەورێز.

" ماڵباتی شەدادی کوڕی کورتەك – کورتۆ لە دوێنو گەنجە – جنزە لە ئەرمینیا.

" ماڵباتی ربيب الدولة: لە ناوچەکانی نێوان ئورمێو بارگیری لە باکووری دەریاچەی خەلات – وان.

کوردناسی ناسراو ڤ ڤ. مینۆرسکی (١٨٧٧ – ١٩٦٦) دەڵێت:

(لە ناوەبڕێکی مێژوویدا لەنێوان هێرشو فراوانخوازییەکانی عەرەبو شاڵاوەکانی تورکدا – مەبەست سەلجوقییەکانە – واتە لە هەردوو سەدەی سێهەمو چوارەمی کۆچی " لە ڕاستیدا چوارەمو پێنجەمی کۆچی" / دەهەمو یازدەهەمی زایینی دوو نەتەوەی بە نەژاد ئێرانی لە باکووری ڕۆژئاوای وڵاتی ئێراندا دەسەڵاتیان گرتەدەست، ئەوانیش دەیلەمو کوردن" (تاريخ قفقاز، ص٤٧).

هەر لە ڕۆژگاری فەتحی ئیسلامییەوە گەلێك تیرەو خێڵو ماڵباتی عەرەب لە شارەکانی تەورێزو ئورمێو شنۆو نەریز نیشتەجێبوونو خۆیان پاوەندیانکردو تا سەرەتای سەدەی (٤ك/ ١٠ز) بەدەستیان مایەوە، واتا تا ئەو دەمەی سەردارانی هۆزی هەزبانی بەخۆداچوونەوەو ناوچەکانیان لە عەرەبەکان وەرگرتەوە، (مسعر بن المهلهل) کە بەخۆی لەو دەمانە هاتووەتە کوردستان ڕاستی پێکاوە کاتێك دەربارەی شاری نەریز دەڵێت:

(مەملەکەتی هۆزی عەرەبی (طي) بوو، خاوەنەکەی (علی بن مر الطائي) بوو..

تا کوردە هەزبانییەکان شارەکەیان گرتو گوندو دێهاتەکانیان وێرانکردو پەکی کاروبارەکانیان خستو لەسەر ئەمو کارە بەردەوامبوون تا دەسەڵاتی سوڵتان – مەبەستی خەلیفەیە – لاوازبووو ترسی هێرشی والییەکانی دەوڵەت نەما، ئەمجا ڕابوون بە ئاوەدانکرنەوەی شوێنە وێرانکروەکانو ناوچەکانیان گەشاندەوەو گوندەکانیان بوژاندەوە، ئەم ئاوەدانکردنەوەیە تا چیای السلقو دینەوەرو وڵاتی شارەزووری گرتەوە)، (الرسالة الثانية ص١٠)[10].

(ابن حوقل) کە ئەویش بە خۆی لە هەمان دەمدا سەردانی ئازەربیجانی کردووە پشتڕاستی ئاخافتنی (مسعر بن المهلهل) دەکاتو ئاماژە بەو ئاوەدانییە دەدات کە کوردە هەزبانییەکان لە شنۆو ئورمێ هێنابوویانە کایەوە (صور الارض، ص ٢٨٩).

*** (عەنازییەکان لە حەلوان و چیاکان و شارەزوور) (٣٣٠ – ٥٠٠ك/ ٩٤٢ – ١١٠٦ز؟)**

*** (هۆزی شازنجان و ابو الشوك الكردي)**

شازنجان – شازەنگان – زەنگەنە (؟) لە هۆزە گەورەو بەناوبانگەکانی هەرێمی چیاکانە، ناوچە شاخازییەکانی نێوان حەلوان و کرماشان بە نیشتمانی دێرینی شازنجان و (گۆران – الجورقان) و چەند هۆزێکی دی دادنرێت، گۆران پتر جێگیرو گوندنشین بوون و بەکاری جوتیاری و رەزەوانی و پەزدارییەوە خەریك بوون، کەچی جەردەیی و رێگری ژێدەرێکی بنەرەتی داهاتی شازنجان بوو، پیاوانی شازنجان شاخەوانی چالاك و جەنگاوەری جەربەزەو چاونەترس بوون، بەردەوام لەسەر رێگای بەغداد – خوراسان کە بە رێگای مەزنی خوراسان دەناسراو بەناوجەرگەی ناوچەکەیاندا تێدەپەری پێشیان بە کاروانیان و رێبواران دەگرت و تالانیان دەکردن و دەیانرووتاندنەوە وەك ئەو رێگریانەی لە ساڵەکانی (٣٢٧ك/ ٩٣٩ز و ٣٢٩ك/ ٩٤١ز) روویاندا، بۆیە ئاساییە ئەگەر یەکەم ناوهێنانی شازنجان لە سەرچاوەکاندا لە ئاکامی کردەوەیەکی رێگریانەوە بێت (اخبار الراضي بالله، ص ١٩٢).

دەبێت هەر لەبەر رێگری شازنجانییەکان بووبێت خیلافەی عەباسی – وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا – کوردێکی بە ناوی عەلیی کوری خالید لە ساڵی (٣٠١ك/ ٩١٤ز) کردە والیی حەلوان (صلە تأريخ الطبري، ص٤٤).

لە رۆژگاری لاوازیی خیلافەو دەستەوەستانیی خەلیفەو پشتگوێخستنی کاروباری هەرێمەکان، (ابو اشوك الكردي) لە چیاکانی حەلوان دەرکەوت و بەرژەوەندی کاربەدەستان و بازرگانانی خستە مەترسییەوەو بووە سەرچاوەی نائارامی و پەشێوی لە ولایەتی رێگای خوراسان، تەنها لەبەر چاونەترسی و چاوقایمیی بە (ابو الشوك) گوزارشتی لێکراوە دەنا نە ناوو ناسنامەو نە سەرگوزشتەی ئاشکرایەو بە شاراوەیی ماوەتەوە[11].

***(عناز ابن ابو الشوك الكردي):**

(ابن ابو الشوك عەنان)ی یەکەم سەرداری ناسراوی شازنجانەو چەسپێنەری دەسەڵاتی هۆزەکەیەتی لە حەلوان و دەوروبەری، ئاشکرایە بوەیهییەکان دوای ئەوەی بەغدایان گرت و دەسەڵاتیان گرتەدەست دانیاننا بە فەرمانرەواییداو بەفەرمی بە پارێزگارو بەرپرسی حەلوان و رێگای خوراسان ناساندیان تا هێمنی و ئارامی ناوچەکە پارێزراو بێت و هاتنوچوون لەم رێگە سەربازی و بازرگانییە گرنگ و زیندووە پەکی نەکەوێت، وێرای سوودوەرگرتن لە شیانی سەربازی و شارەزایی میری شازنجان، رووداوەکانی داهاتوو سەلماندیان کە ئەو سیاسەتەی وا بوەیهییەکان لە بەرانبەر (ابن ابو الشوك) پەیرەویانکرد دروست و سوودبەخشبوو دەرەنجامی باشی لێکەوتەوە، لە لایەك دیاردەی جەردەیی و رێگری خوراسان تارادەیەك بنەبربوو، لە لایەکی ترەوە میری شازنجانی بە

دەنگ داخوازی (معز الدولة ئەحمەد)ی بوەیهییەوە چووو لەو تورکانە هاتەدەست کە لە (ركن الدولة) هەڵگەرابوونەوەو ئامادەنەبوون شەری سامانییەکانی بۆ بکەن و پەرتەوازەی کردن، ژمارەیەکی لێکوشتن و لێ بەدیلگرتن ئەوانەی رزگاریان بوو هەڵهاتن بۆ مووسڵ (تجارب الامم، ٥/ ٣٠٣ك، الكامل، ٦/ ٥٤١).

*** (ابو الفتح محەمەد کوری عەناز) (٣٨١ – ٤٠١ك/ ٩٩١ – ١٠١٠ز)**

(ابو الفتح محەمەد)ی دووەم میری ناسراوی شازنجانە، سەرچاوە مێژووییەکان دەسپێکی دەرکەوتنی و پەیوەندی و خزمایەتیی لەگەڵ (ابن ابو الشوك) دا روون نەکردووەتەوە، بەڵام بە لێکدانەوەی هەواڵی مردنی لە ساڵی (٤٠١ك/ ١٠١٠ز) دەردەکەوێت کە لە دەوروبەری ساڵی (٣٨١ك/ ٩٩١ز) بۆتە میری شازنجان و لە پێشەکی شیعرەکەی (ابن نباتە اسعدی) دیارە نەوەی (ابو الشوکە).

ابو الفتح دەسەڵاتی شازنجانی لە هێزێکی خێڵەکی ناوچەییەوە گواستەوە بۆ قەوارەیەکی سیاسی کاریگەر لە کوردستان و عێراق، وێرای حەلوانی بارەگاو پایتەخت شارەکانی کرماشان و دەسکەرەو داقوقی – بۆ ماوەیەك – بەدەستەوە بوو، لە رووداوو کێشەکانی ناوچەکە ئامادەبوونی هەیەو بە سەدان سوارەی شەرکەری هەبوو لە پیاوانی هەردوو هۆزی شازنجان و گاوان و دەکرێت بە دامەزرێنەری میرنشینەکە بناسرێت (تأريخ هلال الصابيء، ٧/ ٥١ – ٥٢، مراە الزمان، ص١٧).

*** (حسام الدوله ابو الشوك فارسی کوری (ابو الفتح) (٤٠٢ – ٤٣٧ك/ ١٠١٠ – ١٠٤٥ز).**

(حسام الدولة فارس) بێ ئاریشەی ناوخۆیی جێگەی باوکی گرتەوەو بۆ ماوەی پتر لە سی ساڵ حوکمیکرد، لەگەڵ ئەوەی سەردەمەکەی تەناهی و ئارامی درێژخایەنی بەخۆوە نەدیت و پربوو لە شەروشۆرو ئاڵۆزی دەرەکی لەگەڵ دەوروبەرداو دووبەرەکیی ناوخۆیی لەگەڵ براکانی، بە مەزنترین میری عەنازی دادەنرێت و حوکمی پانتایەکی پانوپۆری کوردستانی دەکرد بەتایبەت پاش لەناوچوونی حەسنەوییەکان، میرنشینەکە ئەم شارو بازێرو قەڵایانەی دەگرتەخۆ: حەلوان، کرماشان، دینەوەر، کەنگاور، ئەسەدئاباد، ماهیدەشت، شارەزوور، سامەغان، داقوق، خانیجار[12]، خانەقین، مەندەلی، دەسکەرە، قەڵاکانی رەواندین، ماهکی، (سیروان – شێروانە)، (سندە – سنە)[13]، دژدیلەوەیە، تیرانشا، بلوار، بەردان، ئەرنبە (الكرد في الدينور، ص١٩٥).

وەلێ بوەیهییەکان بە میرایەتی ئەو رازینەبوون و رەتیانکردەوەو لەشکرێکیان ناردە سەری و بەزاندیان، ئەویش کشایەوە حەلوان و پاشان لە گەڵیاندا رێککەوت، (ابن الاثير) هۆکاری ئەم هەڵوێستەی بوەیهییەکانی ئاشکرانەکردووەو لەوانەیە مردنی (ابو الفتح)یان کردبێتە پاساوی برانەوەی دەسەڵاتی عەنازییەکان لە حەلوان و تا رێگا نەدەن کورو برازاکانی بەردەوامی بە دەسەڵات بدەن

(الكامل، ٧/ ٢٩٤).

لە ساڵی (٤٢١ك/ ١٠٣٠ز) (حسام الدولة) بە بیانوی ئەوەی موڵكی باوكی بووە، گەمارۆی داقوقی داو لە عەقیلییەكانی سەندەوەو ڕادەستی موهەلهەلی برای كرد، هەروەها شاری كرماشانی گرتو لە دەستی كوردە قوهییەكانی دەرهێناو بەرپرسی شارەكەی دەستەسەركردو لە ساڵی (٤٣٠ ك/ ١٠٣٩ز) شارۆچكەی خولنجانو قەڵای ئەرنبەشی لە دەست دەرهێنان (الكامل، ٧/ ٤٢٦، ٨/ ٤٥، ٤٠).

هاودەم لەگەڵ ئەم گەشەكردنو پەلهاویشتنە، پێویستی بە دانانی خیلافەی عەباسی هەبوو تا دەسەڵاتی بە شەرعی بناسرێتو چیدی وەك باب و باپیرانی لە ڕیزی ڕێگران و لادەران هەژمار نەكرێت، دیارە ئەم هەوڵەی سەریگرتووەو خەلیفە ئەلقادر بالله بە نازناوی (حسام الدولة) سەربلندیكردووە، ئەویش لای خۆیەوە ڕێزی لە خیلافە دەناو ناوی خەلیفەی لە خوتبەو لەسەر دراو دەهێنا، لەو تاكە دراوەی كە لە فەوتان ڕزگاری بووە ناوی خەلیفەی لە پێش ناوی خۆیەوە نەخشاندووە (الكورد في الدينور، ص ٣٠٩ - ٣١٠).

لەلایەكی ترەوە (ابو الفتح) پەیرەوی حوكمی ناوەندگیری ناكردو بەشداری بە براكانی دەكردو بەشێكی وڵاتەكەی بۆ دابریبوون، هەر لەگەڵ گرتنی شارەزوورو سامەغان لە حەسنەوییەكان بۆموهەلهەلی برای دابیریو مەندەلیو هەردوو قەڵای دژدیلەوەیەو ماهكیی بەخشیە براكەی تری سوورخابو (ابو الفتح)ی كوڕیشی بە جێگری خۆی دانابوو لە دینەوەر، دیاردەی فرە میری ئەنجامی خراپی لێكەوتەوەو بووە مایەی گرژیو پەشێوی نێوان (حسام الدولة)و براكانی كە خۆیان لەو بە كەمتر نەدەزانیو دژایەتیاندەكرد (الكامل، ٧/ ٤٢٦، ٣١١ - ٤٢٧، ٨/ ٤٥).

*** (لاوازبوونی میرنشینو تەكانی غوزە توركەكان):**

هیچ قەوارەیەكی كورد لە سەدەكانی ناوەڕاست بە قەد عەنازییەكان دووچاری دووبەرەكیو شەڕی خۆبەخۆ نەبۆتەوەو ژیانی ماددیو گیانی بەخۆ نەگەیاندووە كە بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ بووە مایەی پوكانەوەو لەناوچوونیان، لە ساڵی ٤٣٠ك/ ١٠٣٨ز ەوە بەردەوام هەڵیاندە كوتایە سەر یەكترو لە تاڵانكردنو سووتاندنی موڵكو ماڵی یەكتر سڵیان نەدەكردەوە.

بەتایبەت لەنێوان برایان (حسام الدولة؟)و موهەلهەل، دواتریش لەنێوان موهەلهەلو كورەكانی حسام الدولة: (ابو الفتح)و سوعدا كە بۆ دەیان ساڵ درێژەی كێشاو لە ئەنجامی ئەم شەڕانە دانیشتووان پتر لە جارێك دووچاری نەهامەتیو ماڵوێرانی هاتنو موڵكو ماڵو سامانیان تاڵانكراو گوندو ڕەزوباخیان هاتە سووتاندن (الكامل، ٨/ ٦٢ - ٦٣، ٧٩).

میرانی شازنجان تینووی خوێنی یەكتر بوونو لە ڕقانو بۆ ملشكاندنی یەكتر داوای هاوكاری سەربازییان لە هێزە بیانییەكان دەكرد، لێرە بە كورتی بەشێك لە كێشە ناوخۆییەكان لەنێوان ساڵانی (٤٣٠ - ٤٣٧ك/ ١٠٣٨ - ١٠٤٥ز) دەخەینەڕوو.

كێشەی ناوخۆیی لە ساڵی (٤٣٠ك/ ١٠٣٨ز) تەقییەوەو ساڵ بە ساڵ پەرەیدەسەندو ژیانی گیانیو ماڵی لێدەكەوتەوەو ئەم كێشە ناوخۆییە درێژخایەنە هۆكارەكی سەرەكی لاوازبوونو لە ناوچوونی میرنشینەكە بوو.

(ابو الفتح) جێگری (حسام الدولة) فارسی باوكی بوو لەسەر دینەوەر، ساڵ بە ساڵ پێگەی خۆی قایمتر دەكردو بێ ڕەزامەندی باوكی هەڵیدە كوتایە سەر قەڵاكانی ناوچەكەو داگیری دەكردن تا نۆرە هاتە سەر قەڵای بلوار.

ژنی خاوەنی قەڵای بلوار لە ترسان هاواری بۆ موهەلهەل بردو داوای لێكرد بگاتە فریای تا قەڵاكەی ڕادەست بكات.

موهەلهەل لە سامەغانی شارەزوورەوە بە دەنگییەوە هاتو بەتەمابوو (ابو الفتح) غافلگیر بكات، ئەویش كە لە نیازی مامی گەیشت پێشی لێگرتو پێكیانداداو هێزەكانی (ابو الفتح) تێكشكانو هەڵهاتن، (ابو الفتح) بە خۆیشی بە دیلی كەوتە دەست مامیو خرایە زیندانەوە.

(حسام الدولة) بۆ دەربازكردنی (ابو الفتح)و سزادانی موهەلهەل لە حەلوانەوە هێرشیكردە سەر شارەزوورو گەمارۆیداو كوڕێكی تری بەناوی سوعدا نارد گەمارۆی داقوق بدات، سوعدا ڕووبەڕووی بەرگری بووەوە، (حسام الدولة) بەخۆی لە شارەزوورەوە بە هانایەوە هاتو سەرئەنجام داقوقیان گرتو تاڵانیكردو چەكو تفاقو پۆشاكی كوردەكانیان بۆ خۆیان برد.

موهەلهەل لە بەرانبەر گوشاری (حسام الدولة فارسدا) لە كاردانەوەیەكی تووندا پەنایبردە بەر علاء الدين محەمەدی كوڕی كاكەوەیە (٣٩٨ - ٤٣٣ك/ ١٠٠٨ - ١٠٤١ز) خاوەنی ئەسفەهانو هەمەدانو پەلكێشیكردە ناوچەكانی (ابو الفتح)و دینەوەریان گرتووو تا كرمانشان هاتنو دەستیان نەپاراست لە زۆرداریو وێرانكاری دەرهەق بە دانیشتووان.

لەلایەكی ترەوە سوورخاب خاوەنی مەندەلیو ماهكێ لە خەریكبوونی (حسام الدولة) برای بە موهەلهەلی برایانەوە دەرفەتی وەرگرتو بە هاوئاهەنگی لەگەڵ میر (ابو الفتح)ی كوڕی وەرامی گاوانی (٤٠٣ - ٤٥٥ك/ ١٠١٢ - ١٠٦٣ز) پەلاماری چەند شوێنێكی حەلوانی دا.

(حسام الدولة) یەك شەو لە داقوق مایەوەو بۆ بەیانییەكەی بە پەلە بەرەو حەلوان كەوتەڕێو هاواری بۆ جەلال الدولة (٤١٦ - ٤٣٥ك/ ١٠٢٥ - ١٠٤٣) كوڕی (بهاء الدولة)ی بوەیهی برد كۆمەكی سەربازی بۆ بنێرێت تا پێش لە دەستدرێژی سوورخابو (ابو الفتح) بگرێت، ئەمجا كەوتەخۆ بۆ بەرەنگار بوونەوەی موهەلهەلو (علاء الدولة) سەرەتا بەتەمابوو وەك پیشەی هەر جارەی خۆی لە قەڵای سیروان قایم بكات پاشان بە دانوستان قەناعەتی بە (علاء الدولة) هێنا چیدی پێشڕەوی نەكاتو سازشی لەسەر دینەوەر كرد تا لە كۆڵی ببنەوە (الكامل، ٨/ ٤٥ - ٤٦، ٦٢ - ٦٤).

پاش دوو ساڵێك (٤١ك/ ١٠٤٢ز) دوژمنداری نێوان كورانی (ابو الفتح) محەمەد سەریهەڵدایەوە، (حسام الدولة) دەیویست (ابو الفتح)ی كوڕی لە زیندانی موهەلهەل سەرفراز بكات، بەم بەهانەیەوە چووەوە شارەزوورو ئاگری بەردایە باژێری (شارەزوور - نیم ئەزرای) و تاڵانیكردو دێهاتو

ئاو و ئاوەدانییەکانی کردە سوتماك و دووڕێچی قەڵای تیرانشاهی دا، دزداری قەڵاکە (ابو القاسم بن عیاص) کەوتە ناوبژی و بەڵێنی بە (حسام الدولة) دا هەوڵدەدات (ابو الفتح) رزگار بکات.

لە دژە هێرشێك دا موهەلهەل ناوچەکانی (سندە – سنە)ی کردە ئامانج و کەوتە تاڵانکردن و سووتاندن، دانیشتووان لە هەردوو لاوە بوونە قوربانی و ماڵوێرانبوون.

(حسام الدولـة) کە زانـی هـەوڵـی(ابـو القـاسم) سـەری نەگرتووە دووبـارە لە حەلوانەوە پێشرەویکردو دێهاتی سامەغانی تـاڵانـکردو موهەلهەلیش لـە دەسـتی هـەڵهات (الکامل، ٨/ ٧٩).

ئەمە لە کاتێکدا چیاکان و هەرێمەکانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی کەوتنە بەر شاڵاوی بەربڵاوی تورکە غوزەکان، تاکە سوودی هەرەشەی ترسناکی غوزەکان ئەوەبوو میرانی عەنازیی ناچار کرد مل بۆ ئاشتبوونەوە کەچ بکەن و نەیاری و دوژمنایەتی یەکتر بەلاوە بنێن تا هەندەی بۆیان بکرێت بەرگەی ئەم مەترسییە بگرن، ئەوەبوو (حسام الدولة) گەڕایەوە حەلوان بەڵام (ابو الفتح) هەرگیز ئازادیی نەدیت و لە زینداندا گیانی لە دەستدا، موهەلهەل بۆ دڵنەوایی (حسام الدولة) کوڕێکی ناردە کنی تا لە تۆڵەی (ابو الفتح) بیکوژێت، وەلێ (حسام الدولة) ئەم کارەی رەتکردەوەو کوڕەکەی بە رێزەوە ناردەوە.

کەچی سوورخابی برایان بە پێچەوانەوە هەڵسوکەوتی کردو ئەم نسکۆیەی (حسام الدولة) فارسی برای بە هەلزانی و (مەندەلی – البندنیجین)، کە پێشتر بە دەستییەوە بوو گرتووەو سوعدای برازای شاربەدەر کرد، لە نێو گەرمەی ئەم دۆخە ئاڵۆزەدا (حسام الدولة) فارس لە قەڵای (سیروان – شێروانە) بە نەخۆشی سەرینایەوەو ماڵباتەکەی و ئایندەی میرنشینەکەی بۆ چارەنووسێکی نادیار بەجێهێشت (العمادالاصفهانی، زبدە النصرە، ص ١٩، الکامل، ٨/ ٩٠ – ٩٢).

(حسام الدولە)و میرانی تری عەنازی بایەخێکی ئەوتۆیان بەلایەنی کارگێری و دارایی ناداو سیستەمێکی بەڕێوەبردنی وایان نەبوو دەسەڵاتیان پتەوو جێگیر بکات و کاروباری رێڤەبەری و باجگری و زەویداری راپەڕێنێت، وێڕای پشتگوێخستنی بوارەکانی ئاوەدانکردنەوەو زانستی و رۆشنبیری، وردتر بڵێین قەوارەیەکی خاوەن مەرج و پێداویستییەکانی میرنشینی ئەو دەمانە نەبوو، نە دەسەڵاتەکی ناوەندی بەهێزو نە پایتەختێکی هەمیشەیی و نەسنوورێکی جێگیر، نەقشبەندی دەڵێت دەسەڵاتی عەنازیی شازنجانی پتر لە رێکخراوێکی خێڵەکی نیوچەکۆچەر دەچوو کە پشتی دەبەست بە هۆزە رەشماڵنشینەکان و چەند قەڵایەك کە وەك کۆگاو گەنجینە یاخود بۆ حەشاردان لە کاتی مەترسی و تەنگاویدا بە کاردەهێنران (الکرد في الدینور، ص ١٩٩).

*** (ابو ماجد موهەلهەلی کوڕی (ابو الفتح) محەمەدی کوڕی عەناز):**

بە مردنی (حسام الدولة) کێشە ناوخۆییەکان نەبڕانەوە، بەڵکو بە گورتر تەشەنەیانکرد، ئەوەبوو سەردارە کوردەکان پشتیان لە سوعدا کردو دایانە پاڵ موهەلهەل، خەلیفەو بوەیهییەکانیش هەر پشتیوانی ئەویان دەکردو بە میری شازنجانیان دادەنا، ئەویش هەرزوو دەستیگرت بەسەر کرماشان و دینەوەرو ماهیدەشت و خستنیە سەر شارەزوورو بە شەر غوزەکانی سەر بە ئیبراهیم یەنالی – دایکبرای تۆغرلبەگ – لە ناوچەکە دوورخستەوە.

هاوکات تۆغرلبەگی سەلجوقی ساڵ بە ساڵ لە بەغدا نزیك دەبووەوەو مەترسی و گوشاری سەلجوقییەکان تا دەهات پەرەیدەسەندو سوورخابی برای موهەلهەلیش لە زیندانی سەلجوقی بوو، لە ئاست ئەم رەوشە ترسناکە میر موهەلهەل بە چەشنی میران و دەسەڵاتدارانی ناوچەکە لە ساڵی (٤٤٢ك/ ١٠٥٠ز) خۆی گەیاندە دەرگای تۆغرلبەگ و گوێڕایەڵی خۆی بۆ دووپاتکردەوەو داوای لێکرد رێگانەدات غوزە تورکەکان چیدی وڵات کاول بکەن و سوورخابی براشی لە بەندی ئازاد بکات، ئەویش رێزی لێناو داواکارییەکانی پەسەندکردو بەڵێنی پێدا دەست لە کاروباری ناوخۆی مەملەکەتەکەی وەرنەدات و بەدەستییەوە بیهێڵێتەوە کە بریتیبوو لە شارەزوورو سامەغان و داقوق و شێروانە و چەند شوێنێکی ترو سوورخابیشی ئازاد کردو قەڵای ماهکیی بۆ گەڕاندەوەو قەڵای راوەندینیشی بۆ سوعدا دابڕی (الکامل، ٨/ ١٢٥).

*** (بەدری کوڕی موهەلهەل (٤٤٥ – ٤٦٧ك/ ١٠٥٣ – ١٠٧٤ز) میری شارەزوورو داقوق)**

میرانی عەنازی هەر لە رۆژگاری کەوتنەوەی دووبەرەکی لەنێوانیاندا و دواتریش هاتنی غوزەکان و تۆغرلبەگ، هێدی هێدی چوار چێوەی دەسەڵاتیان سنووربەند دەبوو، زۆربەی باژێڕو قەڵاکانیان لە دەستداو کەوتنە چنگ سەلجوقییەکان، تەنها داقوق و شارەزوور بە قەڵاکانییەوە بۆ بەدری کوڕی موهەلهەل مابۆوەو بۆ ماوەی بیست ساڵێك بەدەستییەوە بوو.

بەدری کوڕی موهەلهەل لە چاو هاوشانەکانی میرێکی زیرەك و دووربین بووو شیا خۆی لەگەڵ سەلجوقییەکان بسازێنێت و پارێزگاری لە مەملەکەتەکەی بکات، لە رۆژگاری باوکییەوە بەشداریی لە کێشە ناوخۆییەکاندا هەیەو دوای گیرانی باوکیشی وەك بەهێزترین نوێنەری بنەماڵەی عەنازی دەرکەوت و تۆغرلبەگیش هەر بەو ناسنامەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردو دەستدرێژی نەکردە سەر شارەزوورو وەك خۆی هێڵایەوە، لە رووی سەبازییەوەش پشتیوانی لێ دەکرد تا بوار نەدات بە سوعدا هێزەکانی خۆی رێکبخاتەوەو مەترسی بخاتە سەر وڵاتی شارەزوور (الکامل، ٨/ ١٤٥، ١٤٠)(١٤).

*** (سوورخابی کوڕی بەدر (؟ - ٥٠٠ك/ ١١٠٦ز)و پاشماوەی عەنازییەکان)**

سوورخاب دوا میری ناسراوو دەستڕۆیشتوی عەنازییەکانە، سەرەتای حوکمی لە وڵاتی شارەزوور نادیارە هەرچەند لە دەستپێکی سەردەمی سەلجوقییەوە دەنگوباسی بەرچاو دەکەوێت و لە ساڵی (٤٥٥ك/ ١٠٦٣ز) هاوڕێ لەگەڵ تۆغرڵبەگ گەڕایەوە بەغدا، بەڵام وەك فەرمانڕەوای شارەزوور تا دوا ساڵەکانی سەدەی (٥ك / ١١ز) هیچ هەواڵێکی تۆمارنەکراوە، بە گوێرەی ئەو زانیارییە کەمانەی وا لە بەردەستدان دەردەکەوێت میرێکی بە دەسەڵات و خاوەن هێزی چەکدار بووەو لە شەڕو ناکۆکییەکانی نێوان سوڵتانەکانی سەلجوقی بەشداریکردووە (الکامل، ٨/ ٤١٤).

لە کارە گرنگەکانی بنیادنانی قەڵای خەفتیدەکانە لەسەر کەناری زێی بچووك لە نزیك کۆیە، سەرچاوەکان ئاماژەیان بەم کارەی سوورخاب نەداوە، بەڵام بە بەڵگەی ئەوەی پێشتر ناوی قەڵای خەفتیدەکان نەهاتووەو قەڵاکەش هەر بە خەفتیدەکانی سوورخابی کوڕی بەدر ناسراوە بە دڵنیاییەوە دەڵێین سوورخاب قەڵاکەی دروستکردووە (معجم البلدان، ٢/ ٢٤١).

لە سەردەمی سوورخابدا شارەزوورو داقووقی و کەرکوك و زۆربەی ناوچەکانی تری کوردستان کەوتنە ژێر هەژموونی دەیان هۆزو تیرەو بنەماڵەی تورکمان، تورکمانی سولغۆریی و دواتریش قەفجاقیی ئەیوائی بە شارەزووردا بڵاوبوونەوەو چوون بە گژ سوورخابداو تەنانەت بۆ ماوەیەك (٤٩٣ - ٤٩٥ك/ ١١٠٠- ١١٠١ز) قەڵای خەفتیدەکانیان داگیر کرد (الکامل، ٨/ ٤٤٧).

سوورخابی کوڕی بەدر سوودی لە خەریکبوونی کوڕانی مەلیکشاه: برکیاروق و محەمەد بە دژایەتی یەکترەوە وەرگرت و سنووری دەسەڵاتی بەرفراوانکردو ماوەیەك کەنگاوەرو کرماشانیشی گەڕاندەوەو لە هەواڵێکدا بە خاوەنی کەنگاوەر ناوبراوەو بەشێك لە سەروەرییەکانی باب و باپیرانی زیندوو کردەوەو تا لە مانگی شەوالی (٥٠٠ك/ ١١٠٦ز) مرد، (ابن الاثیر) لە کورتە هەواڵێکدا ئەوەندە دەدرکێنێت کە سامانێکی زۆری لە پاش بەجێماو - براکەی - ابو منصوری کوڕی بەدر لە جێگەی بووە میری شارەزوور (الکامل، ٨/ ٤٠٩، ٤١٤، ٥٠٨، الکرد فی الدینور، ص ٢٤٥ - ٢٤٨). لەو باوەڕەدام (ابو منصور) هەر (نەصرە)، ئەوەی (نظام الملك) لە شوێنی بەدری باوکی بە میری شارەزوور دانا، واتا بە خۆی ناوی (نەصرە)و کونیەی (ابو منصورە).

لە ڕووداوەکانی ساڵی ٥٠٢ك/ ١١٠٨ز ناوی میر نەصری کوڕی موهەلهەلی[١٥] کوڕی ابو الشوك الکردی هاتووە کە لە میرانی سوڵتان محەمەد (٤٩٨ - ٥١١ك/ ١١٠٤ - ١١١٧ز) بوو (الکامل، ٨/ ٥٢١).

نابێت وا تێبگەین کە ئەم میرە نەوەی میر (حسام الدولة) ابو الشوك فارس بێت چونکە (حسام الدولة) کوڕی بە ناوی موهەلهەل نەبووەو مێژوونووسان زۆر جاران ناوو نازناوی درێژی کەسایەتییەکان کورت دەکەنەوەو دەیلکێنن بەنازناوی بنەماڵەکانیانەوە[١٦]، (نەصر) لە ڕاستیدا هەر (ابو المنصور نەصری کوڕی بەدری کوڕی موهەلهەلی کوڕی (ابو الفتح) محەمەدی کوڕی عەنازی کوڕی ابو الشوك الکردی)یە.

هیچ زانیارییەك نییە دەربارەی (ابو منصور)و دیار نییە تا کەنگێ وەك خاوەنی شارەزوور ماوەتەوەو لە چ ساڵێکدا مردووەو کێ شوێنی گرتۆتەوە، دەکرێت بڵێین ئەوەندە میرایەتی نەکردووەو بە وێنەی میرەکانی تری کوردستان لە ڕیزی سوپای سەلجوقی ڕێکخراوەو بەهێزەکانییەوە بەشداری شەڕەکانی کردووە (الکامل، ٨/ ٥٢١).

قەڵاو باژێڕەکانی شارەزووریش کەوتنە ژێر هەژموونی دوو بەرەبابی تورکمانی ئەیوائییەوە: قەفجاقیی و پەرچەمی - دواتر لە سەریان دەدوێین - و بەچیاو هەڵەت و دەشت و دێهاتی گەرمیان و شارەزوور بڵاوبوونەوەو دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان بۆ کوردان نەهێشتەوە، بۆ تێگەیشتن لەم ڕاستییە پێویست بە هێنانەوەی بەڵگە ناکات ئەوەندە بەسە بڵێین ناوی قەڵای خەفتیدەکان لە خەفتیدەکانی سوورخابەوە گۆڕدرا بۆ خەفتیدەکانی (صارم الدین بلداجی) کە نۆکەرێکی تورکی سەر بە ئەتابەگییەی هەولێر بوو (وفیات الاعیان، ٣/٥٠٥).

*** (کوردستان لە بەردەم هێرشی تورکە سەلجوقییەکاندا):-**

*** (سەلجوقییەکان: دەرکەوتن و دامەزراندنی دەوڵەت)**

سەلجوقییەکان بنەماڵەیەکی تورکن سەر بە یەکێك لە تیرەکانی هۆزی غوز، غوزیش یەکێکە لەو دەیان هۆزو خێڵ و نەتەوانەی میللەتی تورك پێکدەهێنن، لە وڵاتی پانوپۆڕی تورکستاندا ژیانێکی کۆچەریی و نیمچە کۆچەرییان دەگوزەراند، لەو سەرچاوانەی وا لە مەڕ نەژادو دەکەوتنی سەلجوقییەکان دواون، جیاوازییەکی کەم بەرچاو دەکەوێت سەبارەت بە بنەچەو ناوو نازناوی باب و باپیرانیان.

*** (هەڵوێستی سوڵتانەکانی سەلجوقی بەرانبەر میرنشینە کوردەکان)**

دەرکەوتنی تورکە سەلجوقییەکان و دەسەڵاتگرتنەدەستیان کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر مێژووی کورد بەجێهێشت و بووە مایەی لەناوچوونی دەسەڵاتە خۆجێییەکانی کوردستان و بڵاوبوونەوەو جێگیربوونی ڕەگەزی تورك، ئەو دەمەی تورکە سەلجوقییەکان گەیشتنە هەرێمە کوردنشینەکان ئەم هەرێمانە لەژێر ساباتی ئایینیی خەلیفەی عەباسی و دەسەڵاتی سیاسیی میری بوەیهی لەلایەن میرە کوردەکانەوە بەڕێوەدەبران.

دەوڵەتی بوەیهی ساڵ بە پاش ساڵ لاوازترو بێ و یستتر دەبوو، پاش مردنی هەر میرێکیان گۆبەندو ناکۆکی لەنێوان میراتگرانی سەری هەڵدەدایەوەو دەکەوتنە گیانی یەکتری، دوا میری بەهێزی بوەیهی جلال الدولة ی کوڕی (بهاء الدولة) لە ساڵی (٤٣٥ك/ ١٠٤٣ز) مردو دەبوو (الملك العزیز)ی کوڕی جێگای بگرێتەوە، کەچی ابو کالیجاری کوڕی سلطان الدولة کە دەبێتە برازای جەلال الدولة بەکردەوە نارەزایی خۆی نیشانداو بە پارەو پەیماندان سەرکردەو بەرپرسە

سەربازییەکانی بۆ لایی خۆی ڕاکێشاو (الملك العزیز)ی پسماموی کەنارگیرو تەنگەتاو کرد، ئەویش دادی بۆ میرە کوردو عەرەبەکانی ناوچەکە برد، ابو کالیجار بۆ سالی دواتر بووە میری فەرمی بوەیهییەکان و لە بەغدا خوتبە بە ناوی خوێندرایەوەو خەلیفە القائم دانینا بە شەرعیەتی میرایەتییەکەی، لەگەڵ ئەم ئالۆزیو تەنگەژەیەی دوچاری بوەیهییەکان هاتبوو هێشتا سەروەریو باڵادەستی خۆیان لە کوردستان لەدەستنەدابوو، ئەوەبوو هەریەك لە (حسام الدولة) فارسی شازنجانیو نصر الدولة ئەحمەدی مەروانی لە وڵاتی خۆیان خوتبەیان بەناوی میری نوێی بوەیهییەکانەوە خوێندەوە، بگرە میر (حسام الدولة) بۆ سەلماندنی دلسوزیی خۆی، (الملك العزیز)ی زاوای ناچار کرد کچەکەی تەڵاق بدات (الکامل، ٨/ ٤٠، ٨١ – ٨٢).

شارو قەڵاکانی شازنجانییەکان بەر لە هەمووان بووە یەکێك لە ئامانجەکانی غوزە تورکەکان، تۆغرڵبەگ لە سالی (٤٣٧ك/ ١٠٤٥ز) فەرمانی بە ئیبراهیم یەنالی دایکبرایی دا، هێرش بکاتە سەر هەرێمی چیاکان و ئەویش لە هەمەدانەوە دەستی پێکردو گوشاری خستەسەر قەڵەمرەوی شازنجانی.

هەواڵی پێشرەوییو پەلهاویشتنی لەشکری تۆغرڵبەگ لە کوردستان گەیشتە بەغدا، خیلافە هەستی بە مەترسی کردو یەکسەر سوپاسالار (عین الدولة ابو حرب فولانجانی دەیلمی) و(ابو عبداللهی مەردۆستی) بە خەڵاتو دیارییەوە ڕەوانەی لای (حسام الدولة) فارسی شازنجانی کران و داوایان لێکرد خۆی بۆ بەرپەرچدانەوەی غوزەکان سازبدات و چاودێری سنوورەکان بکات (مجمع الاداب، ٢/ ٣٩٤).

(حسام الدولة فارس) ئەوکاتە لە ڕەوشێکی نالەبار دابوو، چووبووە ناو تەمەنەوەو نێوانی لەگەڵ موهەلهەل و سوورخابی برایدا لە ئەوپەڕی گرژیدا بوو، لە دینەوەرەوە بەرەو کرماشان پاشەکشێی کردو لەوێش دوای ئەوەی هێزێکی لە دەیلەم و کوردە شازنجانەکان ڕاسپارد بەرگری لە شارەکە بکەن بە کەلوپەلەوە بەرەو بارەگای خۆی لە حەلوان بەرێکەوت و لەوێش ئۆقرەی نەگرت و بە ماڵ و خێزان و کەلوپەلەوە خۆی لە قەڵای (سیروان – شێروانە) لە نزیك کەلار لەسەر ڕووباری سیروان حەشاردا، ئیبراهیم یەنال و غوزە تورکەکان سووربوون لەسەر ئەوەی هەرچی باژێرو قەڵاو پایەگا هەیە تاڵان و کاول بکەن و دینەوەرو کرماشان و (الصیمرە)و حەلوان و خانەقینیان داگیر کردو تاڵانیانکردو ماڵ و سامانی خەڵکیان بە تاراج بردومالی خودی (حسام الدولة) فارسیان سووتاند، لەو کاتەدا پەلامارەکانی غوز پتر بۆ چاوترساندن بوو (زبدە النصرە، ص١٠، الکامل، ٨/ ٩٠ – ٩١).

* ( هەڵوێستی تۆغرڵبەگ ):

تۆغرڵبەگ دەستکاری نەخشەی سیاسی کوردستانی نەکرد و دەستی لە کاروباری ناوخۆی میرە کوردەکان وەرنەدا، نەخاسمە پاش ئەوەی زۆربەیان لە سالانی (٤٤٢ – ٤٤٦ك/ ١٠٥٠ – ١٠٥٤ز) پابەندی خۆیان بۆ ڕاگەیاندو خوتبەیان بە ناویەوە خوێندەوەو هیچ کاردانەوەیەکیان ئەنجام نەدا بێتە مایەی پەکخستنی بەرنامە فراوانخوازیەکەی.

لە ڕاستیدا نەیدەویست میرە کوردەکان لە خۆی بوروژێنێت و بەرەی نەیارانیان پێ بەهێز بکات و وزەی سەربازیی دەوڵەت بە بەرەی تری لاوەکییەوە خەریك بکات کە لە یەك کاتەدا دوو کاری گەورەترو گرنگتر چاوەڕێی دەکردن کە بریتیبوون لە شەڕی فاتمییەکان و دوورخستنەوەیان لە عێراق و شام و شەڕی ڕۆمە بیزەنتییەکان لە ئەرمینیا و ئەنادۆڵ.

لە سالی (٤٤٢ك/ ١٠٥٠ز) تۆغرڵبەگ پێشوازیی لە موهەلهەلی کوڕی محەمەدی عەنازی خاوەنی وڵاتی شارەزوور کردو ڕێزی لێناو ڕازیبووو شارەزوورو داقوق و سامەغان و سیروانی بۆ بهێڵێتەوەو سوورخابی برایشی لە زیندان ئازاد کردو قەڵای ماهکێی بۆ گەڕاندەوە و قەڵای ڕاوەندەیێنیشی بۆ سوعدای برازایان دابڕی (الکامل، ٨/ ١٢٥).

سەلجوقییەکان نەریتی وەرگرتنی بارمتە (رهینە) لە نەیارەکانیان هێنایە کایەوە و لە کوردستانیش پیادەیانکرد کەوا دیارە نەریتێکی باو و کارپێکراو بووە لەنێو خێڵە تورکە کۆچەرەکانی تورکستان و ئاسیای ناوەڕاست و بە دروستی مەبەستی پێکاوەو ئەنجامی باشی بەدەستەوە داوە، وەزیرو ڕاوێژکاری کارامای سەلجوقییەکان (نظام الملك) (م ٤٨٥ك/ ١٠٩٢ز) بەڕوونی بەگەندی کردووە و لە کتێبەکەی چەسپاندویەتیو دەڵێت: (پێویستە لەسەر هەر یەك لە میرانی عەرەب و کوردو دەیلەم و ڕۆم و کەسانی دی ئەوانەی تازە بە تازە هاتونەتە ژێر سایەی سوڵتانەوە، کوڕێکیان یان برایەکیان وەك بارمتە بسپێرنە دەرباری سەلجوقی، بەشێوەیەك ژمارەی بارمتەکان هەرچۆنێك بێت ئەگەر هەزار نەبێت ئەوا نابێت لە پێنجسەد کەمتر بێت و پاش ساڵێك ئالوگۆڕ بکرێن بەمەرجێك بارمتەکان نەگەڕێنرێنەوە بەر لە گەیشتنی شوێنگرەوەکانیان، تا هیچ کەس زاتی ئەوە نەکات و نەوێرێت لە سوڵتان هەڵبگەڕێتەوە و یاخی ببێت)، (سیر الملوك، ص ١٤٠).

* ( لاوازبوونی دەوڵەتی سەلجوقیو دەرکەوتنی ئەتابەگەکان ):

لە ڕەمەزانی سالی (٤٨٥ك/ ١٠٩٢ز) وەزیری زرنگ و لێهاتوو (ابو علي الحسن بن علي الطوسي) ناودار بە (نظام الملك) بە دەست باتنییەکان لە نزیك نەهاوەند تیرۆر کرا، مانگێکی نەبرد مەلیکشاهیش نەخۆشکەوت و لە ناوەڕاستی مانگی شەوالدا مرد.

ئەم دوو ڕووداوە کارەساتێکی ترسناك بوو لەسەر چارەنووسی سەلجوقییەکان و گورزێکی کوشندەی لە جەستەی دەوڵەتی سەلجوقی داو ڕۆژگاری سەلجوقییە مەزنەکان (السلاجقة العظام) برایەوەو بەرەبەرە کێشەو هەڤرکیی ناوخۆیی ڕووی تێکردن و سال دوای سال شیرازەی دەسەڵاتیان لەبەرییەك هەڵدەوەشایەوە.

کوڕانی مەلیکشاه: بر کیاروق و مەحمودو محەمەدو سەنجەر بەرەی سێ دایك بوون و هێشتا زارۆك و هەرزەکاربوون و بوونە گەمەی دەستی گەورە سەرکردە تورکەکان دوو لە ژنانی مەلیکشاه: تورکانخاتونی دایکی

مەحمودی چوار ساڵەو زوبیدەی دایکی برکیاروقی دوازدە ساڵە زێدەڕۆیی نەرێنیان گێڕا لە خۆشکردنی ئاگری دووبەرکیی نێو ماڵی سەلجوقیو هەریەکەیان دەیویست کورەکەی ببێتە سوڵتان، هەر لەو ماوەیەدا تەتەشی کوری ئەلب ئەرسەلان مردنی مەلیکشاهی برای بە هەلزانیو خۆی بە میراتگری دادەنا و لە شامەوە هێرشی هێناو دیاربەکرو ئازەربیجانو چیاکانی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە (زبدە النصرە، ص ٨٢ - ٨٣).

لەبەرانبەر لاوازیو بێئەزموونیی برکیاروقو محەمەدو تەشەنەکردنی کێشەو ناکۆکییەکانی نێوانیان، تا دەهات سەرکردە تورك‌و تورکمانەکان بەهێزتر دەبوونو دەسەلاتیان زیاتر دەچەسپاو بە ئاراستەی ئارەزووو بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان سولتانە هەرزەکارەکانیان هەڵدەسووراند[١٧].

لەئاکامدا هەندێك لەم سەرکردانە چەند قەوارەیەکی سیاسیان دامەزراند کە بە دەوڵەتە ئەتابەگەکان - الاتابکیات دەناسرانو دەکرێت ئەم سەدەیە - ٦ك/ ١٢ز - بەسەردەمی ئەتابەگی ناوبنرێت.

ئەتابەگ زاراوەیەکی تورکییەو لێکدراوی دوو وشەیە: ئەتا واتە باوك - باب، بەگ واتە میر، واتە میری باوك، مەبەست ئەو بەندەو کۆیلانەیە کەلە سەرەتاوە لە خزمەت سەلجوقییەکان بوونو ئەرکیان چاودێریو سەرپەرشتیی مندالی سولتانەکان بوو، ئەمانە لە هۆزو نەتەوە تورکییە جۆربەجۆرەکان بوونو دڵسۆزو جێی باوەری سوڵتانەکان بوون، بە هێزو بازووی ئەمان دەوڵەتی سەلجوقی پێیگرتو پەلوپۆی هاویشت[١٨].

ئەوەی ڕاستەخۆ بە دیرۆکی کوردەوە گرێدراوە ئەوەیە کە چوار دەوڵەتی ئەتابەگی لەسەر خاکی کوردستان هاتنە دامەزراندنو هەرچی سوڵتانە سەلجوقییەکان لە دەشتو چیا بۆ میرانی کوردیان هێشتبووەوە، ئەتابەگەکان ئەوەندەشیان پێ ڕەوا نەدیتو داگیریانکرد، ئەو سیاسەتەی ئەلب ئەرسەلانو مەلیکشاە پەیرەویانکرد ئەمان بردیانە سەرو تەواویان کردو بەسەر زۆربەی هەرەزۆری قەڵاو شوراو بارەگاو بازێرو شارەکانی کوردستاندا زالبوون.

ئەو چوار دەوڵەتە ئەتابەگییە بریتین لە:

١-ئەتابەگییەی ئەرتوقی - الاراتقە لە ئامەدو ماردینو میافارقینو حوصنکێفا.

٢- ئەتابەگییەی ئیلدگزی لە ئازەربیجانو چیاکان.

٣- ئەتابەگییەی زەنگی لە مووسڵ.

٤-ئەتابەگییەی هەولێر.

*** (ئەتابەگەیەی زەنگی لە مووسڵ):**

پاش داگیرکردنی مووسڵو لەناوبردنی میرنشینی عەقیلی (٣٨٠ - ٤٨٩ك/ ٩٩٠ - ١٠٩٦ز)، بۆتانو هەکاریو داسنو گشت ناوچە کوردنشینەکانی باکوورو ڕۆژهەڵاتی مووسڵ کەوتنە دەست تورکە سەلجوقییەکانو لەلایەن ئەتابەگەکانی مووسڵەوە بەرێوەدەبران کە ئەمانیش هەر لەو نۆکەرە تورکانە بوون کە لە خزمەت سوڵتانەکاندا بوون:-

" قوام الدولة كربوقا (٤٨٩ - ٤٩٥ك/ ١٠٩٦ - ١١٠٢ز).

" موسى التركماني (٤٩٥ك/ ١١٠٢ز).

" شمس الدولة جگەرمش (٤٩٥ - ٥٠٠ك/ ١١٠٢ - ١١٠٦ز).

بەڵام ئەوەی گومانی تێدا نییە کە زەنگی لە ساڵی (٥٣١ك/ ١١٣٦ز) بە شەر داقوقی گرت (الكامل، ٨/ ٧٣٧)و دەبێت گرتنی هەولێر پێش گرتنی داقوق کەوتبێت چونکی باوەرناکرێت زەنگی بەسەر هەولێردا بازبداتو بە گرتنی داقوقەوە خۆی خەریك کردبێت، دەستخستنی هەولێر لەبەر گرنگیو بەهاداریی شارەکە بوو کە دەروازەی ڕۆژهەڵاتی مووسڵ بووو گرێیدەدا بە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتەوە، بۆیە هەر هەلی بۆ هەلکەوت بێ دوودلی پەلاماری داو گرتی هەرچەند ئەو دەمە بەدەست سەلجوقییەکانەوە بوو (اربيل، ص٤١، عمادالدين زنكي، ص٧٥).

هەواڵی ڕاست ئەوەیە زەنگی لە ساڵی ٥٢٦ك/ ١١٣٢ز چواردەورەی هەولێری دا کە پێشتر بەدەست هەزبانییەکانەوە نەمابوو، سوڵتان مەحمودی سەلجوقی بەئیقتاع دابووی بە مەسعودی برای، مەسعود - پاشان بووە سوڵتان - لە مەراغەوە هات بۆ شەری زەنگیو ڕزگارکردنی هەولێر، زەنگیش ناچار هێزەکەی کشاندەوە سەر زێی مەزن، پاشان ڕێککەوتن لە سەر ئەوەی زەنگی پشتگیریی مەسعود بکات وبە سوڵتانی سەلجوقی دابنێتو گوشار بخاتە سەر خەلیفە المسترشد خوتبە بە ناوی ئەوەوە بخوێندرێت، مەسعودیش دەست لە موڵکییەتی هەولێر هەڵبگرێتو بەپاداشت بیداتە زەنگی (مفرج الكروب، ١/ ٩٧).

مەسعود لەو دەمانە لە ڕیزی خوازیارانی دەستخستنی سەڵتەنەتی سەلجوقیو شوێنگرتنەوەی سوڵتان مەحمود بوو، لە یەك کاتدا سەرقاڵی ململانێ بوو دژی سەنجری مامیو تۆغرلی برایو داودی برازای، نەك هەر ئامادەنەبوو جەنگی دوژمنێکی دی بکات بەڵکو گەلێك پێویستی بە هێزی سەربازیو پشتیوانیی زەنگی هەبوو.

قەڵاو پایەگاکانی شارەزوور کە بەدەست کوردو تورکمانەوە بوون، بەپێی گێرانەوەیەك لە ساڵی (٥٣٤ك/ ١١٣٩ز) گیراون (الباهر، ص ٥٧ - ٥٨)، وەلێ ئەم مێژووە ورد نییە، شارەزوورو گەرمیان پێشترو دوای گرتنی هەولێر کەوتنە بەر پەلاماری زەنگی، (اسامه بن منقذ) بە خۆی بەشداریی هێرشی سەر (الكرخيني - کەرکوك)و شارەزووری کردووەو دەگێڕێتەوە کە پاش گەرانەوەیان لە مەصاف بەغدا - ساڵی (٥٢٦ك/ ١١٣١ز) زەنگی، سەلاحەددین محەمەدی کوری یاغیسیانی ڕاسپارد بچێتە سەر قەڵاکانی قەفجاقی تورکمانی و پاش شەش ڕۆژەرێ گەیشتینە جێ، قەفجاقیش کشایەوە و هەڵهات بەرەو کوێستانەکانی کوردستان - کوهستان - هێزەکەی زەنگی سەرەتا دەورەی قەڵایەکیان دا بە ناوی ماسر (؟)و کەوتنە بنکۆڵکردنی بورجەکانی و بە ئاسانی داگیریانکرد، ئەمجا دەورەی قەڵای کەرکوکیان داو داگیرو تاڵانیانکردو کەوتنە گرتنو دیلکردنی نەساراو جووەکانی قەڵاکە (الاعتبار، ص ٢٥٣ - ٢٥٦).

دەبێت ماسر هەمان ئەو قەڵایە بێت کە ابن واصل

(م ٦٩٧ك/ ١٢٩٨ن) بە مجهیمر (؟) ناوی دەبات و دەڵێت قەڵایەکی سەختی کوردانەو زەنگی لە ساڵی (٥٢٥ك/ ١١٣١ن) گرتوویەتی (مفرج الكروب، ١/ ٤٣).

وادیارە ئەم هێرشەی زەنگی نەبۆتە مایەی لەناوبردنی یەکجارەکی هەژموونی تورکمان وتا ساڵی (٥٣٤ك/ ١١٣٩ن) شارەزووریان بەدەستەوە بوو.

*** (ئیقتاعی سەلجوقی لە کوردستان):**

سەلجوقییەکان سیستەمی دابڕینی زەوی و زارو دابەشکردنی بەسەر میرو فەرمانڕەوا سەربازییەکاندا، واتە سیستەمی (الاقطاع) یان پیادەکرد، چونکە گەلێك هەمواری لەباربوو لەگەڵ سروشتی دەوڵەتەکەیان دەگونجاو لەبری پارە، زەوی دەدرا بە گەورە موچەخۆرانی دەوڵەت بەتایبەت ئەوانەی وا لە ریزەکانی سوپادا خزمەتیان دەکرد، دیارە (نظام الملك) رۆڵێکی بنەرەتی هەبوو لە پەیڕەوکردن و پراکتیزەکردنی ئەم سیستەمە.

وەك ئاشکرایە پایەداربوونی سەلجوقییەکان و باڵادەستییان لە زۆر بارەوە دەگەڕانەوە بۆ خزمەت و ماندووبوونی فرەمەزنی ئەو دەیان هەزار سەرکردەو شەرکەرە مەملوکانە کە لە هۆزو نەتەوە جۆربەجۆرەکانی تورکی بوون و هەتا بڵێی دڵسۆزو گوێڕایەڵی خاوەنەکانیان بوون و مەکۆی زۆربەی سەرکەوتن و پێشرەوییەکانی لەشکری سەلجوقی بوون، (نظام الملك) لە نزیکەوە ئاگای لەم راستییە بووەو سەرنجی سوڵتانی سەلجوقی بۆ راکێشاوەو ئامۆژگاری دەکات هەقی تورکمانەکانی لەبەرچاوبێت و فەرامۆشیان نەکات.

(هەرچەند دوردۆنگی و جارستبوون هەیە لە تورکمان وزۆری ژمارەیان، هەقێکی رەوایان بەسەر دەوڵەتەوەیە، چونکە بەشدارییان لە دامەزراندیدا کردووەو لەپێناویدا ماندووبوونەو بارگەی شەکاتی و ناسۆرییان گرتووە، سەرەرای ئەوەی خزم و کەسی سوڵتانن (سیر الملوك، ص١٤١).

سوڵتانی سەلجوقی دەبوو بەهەر شێوەیەك بێت پاداشتیان بداتەوەو دڵیان رابگرێت و ملکەچی و پشتیوانیان مسۆگەر بکات و پێگەی خۆی پێیان پتەوتر بکات، بۆیە بەردەوام ولایەت و شاری گرنگیان پێدەبەخشین و هەرچیەکیان لە میرە کوردەکان و کەسانی تر بسەندایە لە قەڵاو رەزو باخ و عەقار یەکسەر بەسەریاندا دەیانبەخشییەوە، شایەنی ئاماژەیە دەگمەن ئیقتاعیان دەبەخشییە غەیری ئەمانە عمادالدین زەنگی هەر شارو قەڵایەکی بگرتایە رادەستی یەکێك لە بەندە نزیك و دڵسۆزەکانی خۆی دەکردو ئەم سیاسەتەی لە کوردستانیش پیادە کردو هەولێری رادەستی زین الدین عەلی کوچەك (م ٥٦٣ك/ ١١٦٨ن) کردو شارەزووریشی لە تورکمانی قەفجاقی سەندو بۆ سیف الدین غازیی کوری دابری و داقوقیش وەك ئیقتاع بەخشرا بە (عزالدین الدبیسی)، یەکێك لە نۆکەرەکانی بەناوی (نورالدین حسن البربطي) کردە دژداری جەزیرەی بۆتان، لەمەش سەیرتر بەرێوەبردنی قەڵای کواشێی هەڵکەوتوو لە لوتکەیەکی زنجیرە چیای نێوان دهۆك و زاخۆ لە راست سێمێل سپاردە تەشتدارێکی خۆی، تەشتدار واتا بەرپرسی ئامادەکردنی گەرماو[19].

ناوچەکانی کوردستان بە چەشنی هەموو ئەو ناوچانەی کەوتنە ژێر دەسەڵاتی تورکە سەلجوقییەکانەوە وەك میرات لە باوکەوە دەگوازرایەوە بۆ کورەکانیان، سیف الدین غازیی کوری مەودودی کوری زەنگی لە ساڵی (٥٧٦ك/ ١١٨٠ن) مردو عزالدین مەسعودی برای بووە جێنشینی (٥٧٦ - ٥٨٩ك/ ١١٨٠ - ١١٩٣ن) و جەزیرەی بۆتانیش بە قەڵاکانییەوە درا بە معز الدین سەنجرشاهی کوری و قەڵای ئاگرێش درا بە کورە بچووکەکەی (ناصر الدین کسك)[20].

بەهەمان پەیڕەو شارەزووریش بە میرات بۆ محەمەدی کوری بوزان مایەوە (الکامل ٩/ ٣٠٤ - ٣٠٥)، وادیارە لەم سەروبەندەدا قەڵای شوشیش دراوە بە بەندەیەکی دی بەناوی سەنقری کوری عبدالله و لەوێ نیشتەجێبووە چونکە شێخ بوزانی کوری سەنقر (٥٧٧ - ٦٢٢ك/ ١١٨٢ - ١٢٢٥ن) لەدایکبووی قەڵای شووشە (المنذري، التكملة، ٣/ ١٤٢).

بەڵام کاربەدەست و فەرمانڕەوای دەستڕۆیشتووی مووسڵ و هەولێرو جەزیرەی بۆتان و شارەزوورو ئاکری و داقوق تەنها ئەتابەگ (مجاهد الدین قایماز) بوو (م ٥٩٥ك/ ١١٩٩ن)[21]، کە لە رێگەی جێگرەکانییەوە سەرپەرشتی بەرێوەبردنی مەملەکەتەکەی دەکرد، نە عزالدین مەسعودی زەنگی لە مووسڵ و نە زین الدین یوسفی کوری زین الدین عەلی کوچەك (٥٦٦ - ٥٨٦ك/ ١١٧٠ - ١١٩٠ن) لە هەولێر دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان هەبوو (الباهر، ص ١٧٧، ١٨٣ - ١٨٤، الکامل، ٩/ ٣٥٥).

*** (بڵاوبوونەوەو نیشتەجێبوونی تورکمان لە کوردستان):**

یەکێك لە ئەنجامەکانی داگیرکردنی کوردستان و لە ناوبردنی دەسەڵاتە خۆجێییەکان لەلایەن تورکە سەلجوقەکانییەوە ئەوەبوو کە گەلێك هۆزو خێڵ و تیرەو چاغی تورکمان ئەوانەی لە خزمەت سوڵتانەکان و گەورە فەرماندەکانی سەلجوقی بوون و هەر بە یاوەری ئەوانیش بە جیهانی ئیسلامی بڵاوبوونەوە لە شارو دێهات و ناوچەکانی کوردستان گیرسانەوەو زێدو نیشتمانی هۆزە کوردەکانیان داگیر کردو بۆ خۆیان پاوەندیانکرد لەژێر سایەی دەسەڵاتدارانی سەلجوقی و ئەتابەگی پشتیوانی و ئاسانکاری بەردەوامیان هەندێك لە سەردارە تورکمانەکان هەردەم گوشاریان دەخستەسەر دانیشتووانی ناوچەکانی بن دەسەڵاتیان و هەریەکەو بۆ خۆی چەند قەڵاو دەڤەرێکی لە میرە کوردەکان زەوتکردو قەوارەیەکی سەربازیی بنیاتنا، تا وایی لێهات لە سەدەی (٦ك/ ١٢ن) گۆشەو کەلێن و دەشت و دەر نەما تورکمانی لێ نەبێت و تەواو کۆنترۆڵی زۆربەی قەڵاو شورە گرنگەکانی گەرمیان و شارەزوورو هەولێریان کرد، سوڵتانی سەلجوقی نەك هەر چاوی لە زێدەگاڤییەکانی سەرانی تورکمان دەپۆشی بەڵکو بە ئاشکرا هانیدەدان و پشتگیریدەکردن تا هەندێ دەشێن چ قەڵاو بازێر هەیە بیخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوەو میرو قەڵادارانی کورد پەراوێز بخەن.

قطران التبریزی لە چەند قەصیدەیەکدا گوزارشت لەو

ستەمو زۆردارییە دەکات کە دووچاری خەڵکی ئازەربیجان هاتووە بەدەست تورك و غەزای تورکمانەوەو سکاڵا لە دەست ئازارو ئافەتی تورکمان دەکات (شهریاران گمنام، ص ٢٣٠).
قەرەبولی - القرابلی، سەرداری خێڵی تورکمانی سولغوری هاتبووە شارەزوورو لەگەڵ میر سوورخابی کوڕی بەدر لەسەر لەوەرگا بوو بەشەڕو هەرایان، میر سوورخاب ڕێگای نەدا بێنە ناو لەوەرگاکانی شارەزوورەوە ژمارەیەکی لێ کوشتن، ئەویش هاواری بۆ تورکمانەکان بردو بە کۆمەڵ بەهانایەوە چوون و لە دەوری گردبونەوەو زیانێکی کوشندەیان لە سوورخاب داو نزیکەی دوو هەزار (؟) لە چەکدارەکانیان کوشت و ناچاریانکرد بە بیست کەسەوە هەڵبێت بۆچیاکان، تورکمانی سولغۆریش قەڵای خەفتیدەکان و گشت قەڵەمرەوی سوورخابیان داگیرکردو تەنها شارەزوورو داقوقیان بۆ هێشتەوە، قەڵای خەفتیدەکان تا ساڵی (٤٩٥ك/ ١١٠١ز) بەدەست تورکمانی سولغۆری مایەوە (الکامل، ٨/ ٤٤٧ - ٤٤٨).

وا دیارە قەرەبولی و خێڵەکەی بۆ ماوەیەکی درێژ لە کوردستان ماونەتەوە تا ئەو ڕادەیەی ناوچەیەکی نێوان هەولێرو کەرکوك و شارەزوور بە ولایەتی قەرەبولی یان دەربەندی قەرەبولی ناوزەندبکرێت و تا سەدەی (٨ك/ ١٤ز) هەر بەو ناوە دەناسرا، کە پێمان وایە مەبەست دەربەندی گۆمەسپانە یان دەربەندەکەی نێوان ڕانییە و قەڵادزێیە[٢٢].

بە مردنی سوورخابی کوڕی بەدر دوا میری پایەداری عەنازی لە ساڵی (٥٠٠ك/ ١١٠٦ز) شارەزوور تا ڕادەیەك بێخودان مایەوەو هیچ بەربەستێك نەما پێش لە تەکان و تەوژمی تورکمان بگرێت، لەوانەش تورکمانی ئەیواقی - ئەیوائی کە لە گەرمیان و شارەزوور ئاکەنجیبوون.

ئەیوانی - ئەیواقی هۆزێکی هەرەمەزنی تورکمانەو ناودارترینیانە لە کوردستان، لە نیوەی یەکەمی سەدەی ٦ك/ ١٢ز) دەرکەوتن و لەگەڵێك دەڤەری کوردستان بڵاوبوونەوە، لە هەرێمەکانی ئازەربیجان و چیاکان و هەمەدانەوە تا قەسری شیرین و خانەقین و مەندەلی و پانتایەکی فراوانیان پاوەندکردو چەندین قەڵاو دێهاتیان لە میرە کوردەکان ستاندو بە ئارەزووی خۆیان بێباکانە لە دینەوەرو هەمەدانەوە تا حەلوان و شارەزوور تەراتێنیان دەکرد، تەنانەت شوێنەکانی نیشتەجێبوونیان بە وڵاتی (ئەیوائی - بلاد الایوائیە - ناودەبرا (مجهول، تأریخ دولە الاکراد، ص ٣٠٤).

قەفجاقی کوڕی ئەرسەلانتاش، سەرداری تورکمانی ئەیواقی، قەڵای (کەرخینی - کەرکوکی) کردبووە بارەگای خۆی و زۆربەی قەڵاو شارو دێهاتەکانی شارەزوورو گەرمیانی بۆ خۆی و خێڵەکەی پاوەند کردبووو قەوارەیەکی بە هێزی پێکەوەنابوو، تورکمان لە هەموو کون و کەلەبەرێکەوە لە دەوری کۆبوونەوەوبەندەو ملکەچی بوون و لە ئاخافتنی دەرناچوون، فەرمانڕەوایانی دەورووبەر ناوێران توخنی بکەون، تا لە ساڵی (٥٣٤ك/ ١١٣٩ز) عمادالدین زەنگی سنوورێکی بۆ دانان و سوپایەکی ناردە سەریان و قەفجاقیان شکاندو بڵاوەیان بە هێزەکەی کردو یەك یەك قەڵاو شوراکانیان لێسەندن، ئەویش ورەی بەرداو خۆیدا بەدەستەوە (الکامل، ٨/ ٧٥٥).

ئەم پەلامارەی زەنگی نەبووە مایەی لە بەینبردنی هەژموونیماڵباتی قەفجاق، عزالدین حەسەنی کوڕەزای قەفجاق لە باپیری زیاتر شەڕانی و ترسناك بوو، توانی دەستبگرێتەوە بەسەر شارەزوورو گەرمیانداو قەڵای (الکرخینی - کەرکوك)یشی کردە بارەگاو بە میری چیاکان ناودەبراو ڕەزامەندیی خیلافەشی مسۆگەرکردو شەرعیەتیدا بە دەسەڵاتی، هەر خیلافەش بوو کەرکوکی بەتایبەت بۆ دابڕیبوو، هەروەها پشتیوانی تۆغرلی سێهەمی دوا پاشای سەڵجوقییەکانی کردو دالدەیداو خوشکێکی خۆی پێداو بە هیوای ئەوەی خۆی بکاتە ئەتابەگی و ئەو بکاتە پەردەپۆش و بە ناوی ئەوەوە فەرمانڕەوایی بکات[٢٣].

عزالدین حەسەنی ئەیوائی بەردەوام چەتەیی دەکردو ئاژاوەی دەنایەوەو ڕێبواران و کاروانیانی تاڵاندەکرد، لە ساڵی (٥٨٥ك/ ١١٨٩ز) بە یاوەری تۆغرلی سێیەم و بە پەنجا هەزار تورکمانەوە ڕوویانکردە شنۆو ئورمێ و خۆی و سەلماس و کەوتنە تاڵانکردن و وێرانکاری، مظفر الدین قزل ئەرسەلان ئەتابەگی ئازەربیجان لێیان هاتەدەست و گورزێکی کوشندەی لێدان و گەلێکی لێ کوشتن و پەرتەوازەیکردن و ڕەشماڵ و دەوارو مەڕوماڵاتیان بەدەستکەوت گرت و پاشماوەیان کشانەوە بۆ کەرکوك[٢٤].

مظفر الدین کوگبوری میری هەولێریش، لە ئاست گێچەڵ و لاساریی تورکمانی ئەیوائی بێدەنگ نەبوو، لە ساڵی (٥٨٧ك/ ١١٩١ز) بانگهێشتی حەسەنی ئەیوائی کردە هەولێرو دەستگیری کرد، خەلیفە الناصر ئەم کردەوەیەی ئەتابەگی هەولێری بەدڵنەبوو، یەکسەر لە نامەیەکی سکاڵا ئامێزدا بۆ سولتان سەلاحەددین بێزاری و گازندەی خۆی لە ئاست هەڵسوکەوتەکانی کوگبوری دەربڕی و داوای لێکرد فەرمانبدات میری ئەیوائی ئازاد بکات و کەرکوکی پێبداتەوە، سوڵتانیش لەبەرسڤنامەیەکدا کارە نابەجێیەکانی میری ئەیوائی بۆ خەلیفە ڕوونکردەوەو پەیمانی پێدا لە کوگبوری دەخوازێت لەگەڵ خۆی بیهێنێت بۆ شام تا لە ڕیزی سوپای موسڵمان ڕێکبخرێت و بەشداری شەڕی جیهاد بکات[٢٥].

تورکمان دەڤەری هەولێریشیان بەدەردی شارەزوورو گەرمیان برد، کۆچەرانی تورکمان لە مێرگ و پاوەندەکانیدا بڵاوبوونەوەو ڕەشماڵیان هەڵدا، تورکمانی بابەکری - کە پێشتر بە هەڵە وادەزانرا کوردن - جەماعەتی میر بابەکری کوڕی میکائیل بە مەڕو ماڵاتەوە ڕوویانکردە دەشتی هەولێر بەمەبەستی دەستخستنی پاوەندو لەوەڕگا، میری هەزبانی ڕێگەی لێگرتن و بڵاوەی پێکردن و تاڵانیکردن، پاشان تورکمانەکان لە دژە هێرشێکدا میری هەزبانییان بەزاندو هەولێریان داگیر کردو بۆ ماوەی سێ ساڵان (٥١٧- ٥٢٠ك/ ١١٢٣- ١١٢٦ز) حوکمی شارەکەیان کردو برازایەکی بابەکر بە فەرمانڕەوا دانرا، لەو ماوەیەدا ستەمکارانە هەڵسووکەوتیان لەگەڵ خەڵکەکەی کردو بە باج و پارەسەندن باریان گرانکردن و ژمارەیەکی زۆریان ناچار کرد هەڵبێن بۆ گوندی منارە - عیسالاڵان بۆ لای عیسای کوڕی لەل - لال -

(م ٥٥٨ك/ ١١٦٣ن).[٢٦]

زین الدین عەلی کوچەك بە خۆی لە بنەڕەتدا سەرداری خێڵێکی کۆچەریی تورکمان بوو، بەدەستوپەیوەندو ئەسپ و دەوارو مەڕو ماڵاتەوە لە مێرگوزاری نغاتووەوە کۆچیکردو لە خاکی هەولێر گیرسایەوە (القاشانی، تأریخ اولجایتو، ص ١١٠).

تورکمان بەشێوەیەکی گشتی سەرچاوەی نائارامی و ئاڵۆزیبوون لە ناوچەکە، بەیناوبەین دانیشتووانیان ئازاردەداو ماڵ و سامانی خەڵکیان دەکردە ئامانج و پێشیان بە ڕێبواران و بازرگانان دەگرت و دەیانڕووتاندنەوە، کاربەدەستانی خیلافە لە بەغدا لە ئاست ئەم سەرپێچی و دەستدرێژیانە جاروبار دەهاتنە دەنگ، لە ساڵی (٤٩٨ك/ ١١٠٤ن) ئیلغازیی کوڕی ئەرتوق بەرپرسی بەغدا، بەلکی کوڕی بەهرامی برازای نارده سەر تورکمانەکانی ولایەتی ڕێگای خوراسان - ناوچەکانی حەلوان و خانەقین - سەرکوتیکردن پاشان قەڵای خانیجاری لە میر سوورخابی کوڕی بەدر ستاند (الکامل، ٨/ ٤٨٠).

شایانی ئاماژەیە عمادالدین زەنگی بە شێوازێکی دی سەرەدەری لەگەڵ کێشەی تورکمانی ئەیوائی کردو سیاسەتێکی وای پیادەکرد کە هەم تارادەیەك لە کۆڵ خۆی کردنەوەو شارەزووری لێ پاککردنەوەو هەم بەکاریهێنان بۆ شەڕی خاچهەڵگران، ئەوەبوو ژمارەیەکی زۆری لێ گواستنەوەو لە ولایەتی حەلەب نیشتەجێیکردن و داوای لێکردن بە جەنگی جیهاد ڕابن، (ابن الاثیر) ئەم کارەی بە بەڵگەی زیرەکی و دووربینیی زەنگی هێناوەتەوە (الباهر، ص ٨٠، الروضتین، ١/ ١٨٥)[٢٧].

پەرچەمی ئەیوائی یەکەم ڕێبەری ناسراوی بنەماڵەیەکی تری تورکمانی ئەیوائیە ولە ناوەڕاستی سەدەی ٦ك/ ١٢ز سەریهەڵدا، جەماعەتەکەی وەك سەرجەم تورکمانەکان زێدەگاڤی و سەرپێچیان دەکردو گرفت و کێشەیان بۆ خیلافەی عەباسی و ئەتابەگییەی زەنگی و ئەتابەگییەی ئیلدگزی و میرە کوردەکان دەنایەوە، کار بەوە گەیشت خەلیفە (المقتفی) لە ساڵی (٥٥٣ك/ ١١٥٨ن) منکبرس المسترشدی ڕاسپارد بچێتە سەریان و سزایان بدات، ئەویش هێرشیکردە سەریان لە چیاکان و تێکیشکاندو ژمارەیەکی لێکوشتن و ژمارەیەکی لێبەدیل گرتن کەلەسەری کوژراوەکان و دیلەکانی هێنایە بەغدا (الکامل، ٩/ ١٣٥).

گۆبەندی تورکمان پەرچەمی ئەیوائی سنووری شارەزووری بەزاندو گەیشتە هەمەدان و دینەوەرو لەوێش کەوتنە چەتەیی و تاڵان و ڕاوەڕووت و ئازاردانی گوندنشینان و کاروانیان، ئەتابەگی ئازەربیجان ئیلدگز لە ساڵی (٥٦٨ك/ ١١٧٢ن) لێیان هاتەدەست و کەوتە گیانیان و پەرتەوازەیکردن و تا نزیك بەغدا ڕاوینان (الکامل، ٩/ ٢٦٥).

فخر الدین ئیبراهیمی کوڕی پەرچەم لە ساڵی (٥٩٥ك/ ١١٩٨ن) لەلایەن خەلیفە الناصرەوە کرایە میری ئەیوائی و چەند شارێکی بۆ دابڕدرا، دوای کوژرانی لە ساڵی (٦٠٠ك/ ١٢٠٣ن)، بەدەست باتنیەك پەرچەمی کوڕی مەحمودی کوڕی پەرچەمی برازای شوێنی گرتەوە، دواتر ڕێبەرایەتی تورکمانی ئەیوائی کەوتەدەست شهاب الدین سلێمانی کوڕی پەرچەم کە مەزنترین و ناسراوترین میری ئەیوائیەو بە سلێمان شاه ناودەبرا، خەلیفە الناصر خەڵات و شیرو پۆشاکی میرایەتی و دە هەزار دیناری پێبەخشی، لەو ڕۆژەوە تا کوژرانی لە بەغدا بە دەستی مەغۆل. لە ساڵی (٦٥٦ك/ ١٢٥٨ن) میرو ڕێبەری تورکمانی ئەیوائی بوو[٢٨].

بەرەبابی پەرچەم و تورکمانی ئەیوائی بە تەواوی ویست و مەبەستی خۆیان بەسەر خیلافەدا سەپاندبوو و جڵەوی دەسەڵاتیان گرتبووە دەست و زۆربەی ناوچەکانی گەرمیان و شارەزوورو حەلوانیان پاوەندکردبوو و بەسەر کەسوکارو لایەنگرانیاندا دابەشکردبوو و گێچەڵ و گۆبەندیان خەلیفەو بەرپرسانی هەراسانکردبوو، هەر لە دەرئەنجامی باڵادەستییان، وڵاتی (اللحف) بە ئیقتاع درا بووە سیف الدین توغولی الناصری خەزوری فخر الدین ئیبراهیمی کوڕی پەرچەم و داقوق[٢٩] و تکریتیش ئیقتاعی فلك الدین سەنقر الطویل (م ٥٩٦ك/ ١١٩٩ن)ی مێردی خوشکی سلێمانشای ئەیوائی بوو، فلك الدین محەمەدی کوڕی سەنقر (م٦٤٤ك/ ١٢٤٦ن) کە دەبێتە خوشکەزای سلێمان شا بە فرمانی خەلیفە المستنصر (٦٢٢ - ٦٤٠ك/ ١٢٢٥ - ١٢٤٢ن) کرایە سەرداری شارەزوورو زەویوزارێکی فراوانی بۆ دابینکرا کە داهاتی ساڵانەی سەد هەزار دینار بوو[٣٠].

تورکمانەکانی کوردستان زیاتر ڕەوەندو پەزلەوەڕێن بوون و بە مەڕوماڵاتەوە بە دوای پاوەندو لەوەڕگادا دەگەڕان و هەر جێگایەکیان لا پەسند ولەبار بوایە بارگەو ڕەشماڵیان تیا هەڵدەداو شان بە شانی ڕەوەندانی کورد گەرمیان و کوێستانیان دەکردو تەنگیان بە ڕەوەندانی کورد هەڵدەچینی، ئەوانیش پێشیان پێدەگرتن و بۆسەیان بۆ دەنانەوە، ئەم هەلومەرجەش جاروبار ئاڵۆزی و گرژی لێدەکەوتەوەو خوێنی تێدا دەڕژا، هەردوولا بە چاوی دوژمن لە یەکتریان دەڕوانی و ڕووداوێکی لاوەکی دەبووە هۆکاری بەرپابوونی شەڕێکی گشتگیر لەنێوانیاندا.

لە ئاکامی کێشەیەکەوە لە ساڵانی (٥٨٠ - ٥٨١ك/ ١١٨٤ - ١١٨٥ن) شەڕو کوشتارێکی بەربڵاو لەنێوان کوردو تورکمان هەڵگیرسا و هەشت ساڵ درێژەی کێشا و زۆربەی دەڤەرەکانی کوردستانی تەنییەوە لە نەصیبین و تور عابدین و دیاربەکر و مووسڵ و شارەزوورەوە تا زۆزانەکانی خەڵات و هەکاری و ئازەربیجان و ژمارەیەکی زۆر لە هەردوولا بەکوشت چوون، تا مجاهد الدین قایماز ئەتابەگی هەولێر و مووسڵ سەرانی هەردوو لای گاز کرد بۆ هەولێرو پێکیهێنانەوە[٣١].

سەرچاوە سریانییەکان زانیاری وردتر ئاشکرا دەکەن و کارەساتەکە ڕوونتر نیشاندەدەن[٣٢] و دەگێڕنەوە تورکمانەکان دەستەدەستە بە دەشت و کێوەکاندا دەسووڕانەوەو بێ بەزەییانەوە بەبێ هۆ ژن و پیاو و گەورەو بچووکی کوردەکان و هەر کەسێکیان بکەوتایەتە ڕێگا دەیان کوشت و چ گوندێکیان تووش بهاتایە کاولیاندەکردو زۆر گوندی کوردنشینیان کوێر کردەوەو چیا بەدەریان کردن، کوردەکان نەیاندەوێرا بە ئاشکرا خۆیان دەربخەن و ماڵ و منداڵ و مەڕوماڵاتیان لە گوندە مەسیحیەکان شاردبۆوە، ئەمجا کەوتنە گیان ئەو

گوندە مەسیحیانەی وا دالدەی كوردانیان دابوو و مال‌و كەلوپەلیان بۆ هەلگرتبوون، ئەوانەی دەربازبوون لە نزیك شارەكان جێگیربوون[٣٣].

رەنگە پەرەسەندنی گێچەل‌و زۆرداریی توركمان لە كوردستان بە شێوەیەك لە شێوەكان لە دەركەوتنی سولتان سەلاحەددین‌و درێژبوونەوەی سنووری دەولەتی ئەیوبی بۆ مووسل‌و كوردستان سەرچاوەی گرتبێت، رۆژهەلاتناس هاملتون گیب (١٨٩٥- ١٩٧١) لەم بارەیەوە دەلێت:

سەلاحەددین تورك نەبوو و كوردبوو، ئەگەر توركەكان كینیان لە هەموو نەتەوە موسلمانەكانی دی دەبووەوەو بەكەمیان دەزانین بە هۆی ئەو هەستكردنە بە لووتبەرزی‌و لەخۆباییبوونەی كە دابونەریتە سەربازییەكانیان لە ناخیاندا چاندبووی‌و بەهۆی پاوەندكردنی دەسەلاتیش لە رۆژهەلاتی ئیسلامی لەلایەن میرەكانیانەوە، ئەوا بە چاوێكی پڕ لە كەرب و سوكایەتییەوە دەیانڕوانییە دەرهاوسێیە كوردەكانیان (سەلاحەددین ئەیوبی، ص ١٩٠).

ئەم بۆچوونەی گیب تەواو لە جێگەی خۆیەتی، ئەوەتانێ مێژوونووسێكی خەلكی روها دەگێڕێتەوە كە توركمانەكان بۆ ئەوەی چۆك بە كوردەكان دابدەن‌و ورەیان بڕوخێنن دەنگۆی ئەوەیان بە گوێیاندا دەدا كە گوایە سولتان سەلاحەددین مردووە (تأريخ الرهاوي، ص ٢٢٥).

لەو رۆژەوە توركمان بە یەكجاری لە كوردستان نیشتەجێبوون‌و تادەهات رێژەیان زیادیدەكرد.

*** كوردو كوردستان لە كۆتایی سەردەمی خیلافەی عەباسیدا ( ٥٧٥ - ٦٥٦ك/ ١١٧٩ - ١٢٥٨ز)**

*** ( بوژانەوەی خیلافەی عەباسی ):**

سەلجوقییەكان لە ناوەراستی سەدەی شەشەمی كۆچی دوازدەهەمی زایینییەوە بەرەبەرە تا دەهات لاوازو بێدەسەلات دەبوون‌و كێشەو ململانێیە ناوخۆییەكان تەواو جەستەی دەولەتی سەلجوقیی داتەپاندبوو و گوروتینی جارانی تیا نەهێشتبوو، بە مردنی سولتان مەسعود (٥٢٥ - ٥٤٧ك/ ١١٣١ - ١١٥٢ز) دوا سولتانی بە هێزو دەستڕۆیشتووی سەلجوقییەكان شادمانیی بنەمالەی سەلجوقی نەماو كەسێكی شیاو هەلنەكەوت جێگای بگرێتەوە (الكامل، ٩/ ٧٤).

لە بەرانبەردا خیلافەی عەباسی بووژایەوەو گوروتینی بەبەردا هاتەوەو لە سالی (٥٥٢ك/ ١١٥٧ز) توانی بە یەكجاری خۆی لەژێر چەپۆكی سەلجوقییەكان دەرباز بكات (بدری محمد فهد، تأريخ العراق، ص ١٥٣).

لە راستیدا خەلیفە (المقتفي) بە پێشەنگی قۆناغی زیندووبوونەوەو بووژاندنەوەی خیلافەی عەباسی دادەنرێت‌و تارادەیەك سەروەری‌و بالادەستی بۆ بەغدا گەراندەوە چەند سەركەوتنێكی بەسەر سەلجوقییەكاندا تۆمار كرد (ابن الطقطي، الفخري، ص٢٩٧).

هەرچەندە هەولەكانی بوژاندنەوەی خیلافە لە سەردەمی هەردوو خەلیفە (المستنجد بالله) (٥٥٥ - ٥٦٦ك/ ١١٦٠ - ١١٧٠ز)و (المستضيء بالله) (٥٦٦- ٥٧٥ك/ ١١٧٠ - ١١٧٩ز) نوشستی هێناو خەلیفە تارادەیەك پێگەی خۆی لە دەستدا، بەلام ئەم رەوشە ئەوەندەی نەخایاندو بۆ جارێكی تر سەروەری‌و پایەبەرزی بۆ خیلافە گەرایەوەو رابوونەوەیەكی بەرچاوی بەخۆیەوە دیت لەسەر دەستی خەلیفە (الناصر لدين لله) (٥٧٥ - ٦٢٢ك/ ١١٧٩ - ١٢٢٥ز) كە بە كۆدەنگی مێژوونووسان بە هێزترین‌و لێهاتوترین خەلیفەی عەباسییە لە دەورانی كۆتایی خیلافەداو خودان كەسایەتییەكی بەهێزبوو، لە سەردەمی ئەودا دەولەتی سەلجوقی بە یەكجاری لەناو چوو (الفخري، ص ٣٠٨).

ئەوەی لێرەدا گرنگەو پەیوەندیی راستەوخۆی بە دیرۆكی كوردەوە هەیە ئەوەیە كە خەلیفە (الناصر) توانی دەسەلات بۆ سەر ناوچە گەلێكی كوردستان بگەرێنێتەوەو راستەوخۆ لەلایەن نوێنەری خیلافە یان سەركردە توركە كۆیلەكانی سەر بە خیلافە بەرێوەببرێت بە تایبەت ناوچەكانی لورستان‌و داقوق‌و دەربەندی حەلوان، واتە ئەو دەڤەرانەی كە هاوسنووری عێراقن، هاوكات سەردارو كوێخاو سەرۆك هۆزەكانی كوردستانیش كە لە ناوچەكانی ژێر دەسەلاتیاندا پلەوپایەیەكی رەهایان هەبوو رێزیان لە خیلافە دەگرت‌و دانیاندەنا بە سەروەری‌و پایە بلندی خەلیفەو خوتبەیان بە ناوییەوە دەخوێندەوەو شانازیان بەوەوە دەكرد كە خەلیفەی عەباسی لای خۆیەوە رەزامەندی دەربڕیوە لەسەر دەسەلاتیان، ئەم پەیوەندییە دۆستانەیەش تا رۆژگاری هێرشەكانی مەغۆل‌و داگیركردنی بەغداو لەناوبردنی خیلافەی عەباسی بەردەوامبوو، هەرچەند خیلافە تووشی گەلێك مەترسی هات‌و دوای مردنی خەلیفە (الناصر) شكۆی جارانی نەما.

*** ( مظفر الدين كوگبوری میری هەولێر ( ٥٨٦ - ٦٣٠ك/ ١١٩٠ - ١٢٣٢ز):**

مظفر الدين كوگبوری كورە گەورەی زین الدين عەلی كوچكە، وەلێ دوای ماوەیەك لە مردنی باوكی لە سالی (٥٦٣ك/ ١١٦٨ز) لەلایەن ئەتابەگ مجاهد الدين قایمازەوە لە دەسەلات دوورخرایەوەو ناچار كرا لە هەولێر دوور بكەوێتەوەو (زين الدين يوسف)ی برا بچووكی كرا بە میری هەولێر كە تەنها بەناو میر بوو مجاهد الدين قایماز بەخۆی سەروەرو فەرمانرەوا بوو (أربيل في العهد الاتابكي، ص٦٨).

زین الدين یوسف لە سالی (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز) لە كاتێكدا بە لەشكری هەولێرەوە بەمەبەستی جیهاد لە خزمەت سولتان سەلاحەددین بوو لە (الناصرە) نەخۆشكەوت‌و مرد، دەنگۆی ئەوەش هەبوو كە كوگبوری ژەهر خواردی كردبێت[٣٤].

كوگبوری بێ گوێدان بەم رووداوە یەكسەر داوای لە سولتان سەلاحەددین كرد حەران‌و روهای لێوەربگرێتەوەو لە بریيان هەولێری بداتێ، سولتانیش بۆ رێگەگرتن لە دەستێوەردان‌و فراوانخوازیی مجاهد الدين قایمازو ئەتابەگییەی مووسل‌و بەهێز كردنی پێگەی هەولێر داواكەی پەسەند كردو وێرای هەولێر، شارەزوورو دەربەندی قەرابولی‌و ولاتی قەفجاق - كەركوكیشی بۆ دابڕی (النوادر السلطانية، ص ٢٥١، الكامل، ٩/ ٤٤٧).

جێگرو نوێنەرانی کە لە میرە کوردەکان و نۆکەرە تورکەکان پێکدەهاتن ئەم شوێنانەیان بەڕێوە دەبرد، نۆکەرێکی بەناوی قرطاي بن عبدالله جێگری بوو لە دەربەندی گەورەو رایاتو جێگرێکی لە (الکرخینی - کەرکوك) بە (الشجاع) ناوی هاتووە (قلائد الجمان، ١/ ٢٦٨، ٤/ ٣٠٢).

کوگبوری بۆ پتر لە چل ساڵان حوکمی وڵاتی هەولێری کردو بە پێچەوانەی ئەتابەگە تورکنەژادەکانی دیبەوە رۆڵی هەرەمەزنی گێڕا لە پێشخستنی فرەلایەنی هەولێرو بردییە ریزی باژێرە زیندووو ئاوەدانەکانی جیهانی ئیسلامییەوە،

مێژوونووسان بەدرێژی لەسەر ژیانو سەربوردەی راوەستاونو کارە خێرخوازی و زانستییەکانیان خستووەتەروو[٣٥].

کوگبوری بەردەوام لەگەڵ ئەتابەگەکانی مووسڵ لە نەوەی عمادالدین زەنگیی گەورەو دواتریش بدرالدین لؤلؤ (٦١٥ - ٦٥٧ك/ ١٢١٨ - ١٢٥٩ز)، ئەوان هەولێریان بە موڵکی خۆیانو بە پارچەیەك لە ئەتابەگییەی مووسڵ دەزانیو بەوچاوە لە کوگبورییان دەروانی کە نوێنەرو دەمراستی ئەیوبییەکانە بەسەر هەولێرەوەو لە دژی ئەوان قوتکراوەتەوە، (ابن الاثیر) راستو رەوان دەڵێت: (کوگبوری گرێیەك بوو لە گەرووی بنەماڵەی ئەتابەگی هەرچەندیان دەکرد بۆیان قوتنادرا)[٣٦].

عز الدین مەسعودی دووەم کوری نورالدین ئەرسەلان شا لە ساڵی (٦١٥ك/ ١٢١٨ز) مردو نورالدین ئەرسەلان شای کوری کە تەمەنی تەنها دە ساڵان بوو بە شوێنگرەوەی دەستنیشانکرا، بەمەش کاروباری دەسەڵاتەکان بە یەکجاری کەوتەدەست بدر الدین لؤلؤ کە کەسایەتییەکی زیرەكو زۆرزانبوو، عمادالدین زەنگیی خاوەنی ئاکرێو شووش خۆی بە شایستەی جێگرتنەوەی عزالدین مەسعودی برای دەزانیو هەستی بە بەدنیازی بدر الدین لؤلؤ کردو دڵنیابوو لەوەی بەتەمایە پێگەی خۆی لە مووسڵ بچەسپێنێتو ئەمان پەراوێز بخات، ئەوەبوو نارەزایی خۆی دەربڕیو دەستیگرت بەسەر ئامێدیو قەڵاکانی هەکاریو زۆزانو کواشێو کوگبوریی خەزوریشی پشتیوانی ئەم هەنگاوەی کرد، کەچی پاش کەمتر لە سێ ساڵ جێگرانی قەڵاکانی هەکاریو زۆزان کە پتر لە نۆ کەرانی تورکبوون لە دژی ساکاریی سیاسی زەنگی پەیوەندییان کرد بە بدرالدین لؤلؤو قەڵاکانیان بەدەستەوەدا، دوای ساڵانێك بدر الدین لؤلؤ گەمارۆیەکی درێژخایەنی خستەسەر قەڵای شووش، گەمارۆدراوانیش کە دیتیان کەس بە فریایان ناکەوێتو کەس نییە رزگاریان بکات ناچار بە رێککەوتن قەڵاکەیان رادەستکردو لە ساڵی (٦٢٢ك/ ١٢٢٥ز) بدر الدین لؤلؤ ئامێدیو هروریشی گرتەوە[٣٧].

عمادالدین زەنگیش سەر گەردانو مایەپووچ گەرایەوە هەولێرو بێوچان لە هەوڵی ئەوەدا بوو میراتی باوپیرانی وەربگرێتەوە، کوگبوریش دڵنەواییکردو بە دابرینی شارەزوور قەرەبوویکردەوە (وفیات العیان، ٥/ ٢٠٨).

بۆیە کاتێك جلال الدین منکبرتی لە ساڵی (٦٢٢ك/ ١٢٢٥ز) هاتە ناوچەکەو لە مێرگەکانی شارەزوور بارگەی خست، زەنگی خۆی گەیاندێو تکای لێکرد مووسڵی بۆ بستێنێتەوە، لێرەدا دەردەکەوێت کە شارەزوور لەم ساڵەوە یان کەمێك پێشتریش بەخشراوە بە زەنگیو تا مردنی لە ساڵی (٦٣٠ك/ ١٢٣٢ز) بە دەستییەوە مایەوەو پاش خۆی بۆ نورالدین ئەرسەلانشای کوری بە میرات مایەوە کە بە خودانی شارەزوور ناودەبرا[٣٨].

وەك پێشتر باسکرا، سەرباری هەولێری بارەگاو ناوەندو شارەزوور، ناوچەکانی کەرکوكو شنۆو خەفتیان - هاودیانو رایاتو هەریرو خەفتیدەکانو ئاکرێو رانییەو پشدەر بەدەست کوگبورییەوە بوون، میرانی سۆرانیو گەڵاڵیو حەمیدیو مەروانیو هەزبانی لە خزمەتیدابوون، لەژێر ساباتی پاشاکانی ئەیوبی حوکمی ئەم بەشەی کوردستانی دەگێرا، هەر لە تاق لاوییەوە جێگەی باوەرو متمانەی سوڵتان سەلاحەددین بوو، سوڵتان رەبیعە خاتون (م ٦٤٣ك/ ١٢٤٥ز) ی خوشکی پێدا.

لە مانەش گرنگتر کوگبوری ماوەیەك بەتەمابوو یاخود وا خۆی دەردەخست کە هیواداره پاش مردنی هەولێر بسپێردرێت بە ئەندامێکی ماڵباتی ئەیوبیو لە چوارچێوەی دۆستایەتیو هاوپەیمانی لەگەڵ (الملك المعظم عیسی) (م٦٢٤ك/ ١٢٢٧ز)ی کوری (الملك العادل) میری دیمشق داوای لێکرد (الناصر داودی) (م ٦٥٥ك/ ١٢٥٧ز) کوری رەوانەی هەولێر بکات، (الناصر داود) لە ساڵی (٦٢١ك/ ١٢٢٤ز) گەیشتە هەولێرو کوگبوری بە گەرمی پێشوازیو میواندارییکردو مووچەیەکی باشی بۆ تەرخانکرد تا لە نزیکی بێتو بە خۆی چاودێریو پەروەردەی بکاتو دوای مردنی ببێتە میراتگری مەملەکەتەکەیو پشدەرو رانییەشی بۆ کردە دیاری[٣٩].

میری ئەیوبی لەو جۆرە کەسایەتییانە نەبوو بشێت ئەرکێکی وا قورس لە ئەستۆ بگرێت، بەڵکو لەنێو ئەیوبییەکاندا دەگمەن ئەندامێکی وا سستو لاواز هەبوو، ئەو دڵی بە هەولێرو ئیقتاعەکانی ناکرایەوەو بیری کەیفو خۆشیی دیمەشقی دەکرد، بۆیە پاش دوو ساڵێك ئارامی لەبەربراو گەرایەوە دیمەشق (مجهول، تأریخ دوله الاکراد، ص ٣٥٢ - ٣٥٣ - ٥٢٩).

*** (گرتنی هەولێر لەلایەن سوپای عەباسییەوە):**

گوکبوری لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا ویستی لە خیلافەی عەباسی زیاتر نزیك بێتەوەو لە دەستپێکی ساڵی (٦٢٧ك/ ١٢٣٠ز) بە یاوەری (محی الدین یوسف ابن الجوزی) و (سعد الدین حسن) بەدەم داخوازی خیلافەوە چووو گەیشتە بەغداو بە شێوەیەکی فەرمیو لە ئاستێکی بەرزدا پێشوازیی لێکراو کەژاوەی بۆ سازدرا، بۆ ماوەی بیست رۆژ لە بەغدا مایەوە، پاشان بە یاوەریی هەردوو نوێنەری خەلیفە (المستنصر) گەرایەوە هەولێرو یەکسەر خوتبەی بۆ ئەیوبییەکان راوەستاندو تەنها بۆ خەلیفەی دەخوێندەوە، لەم سەردانەیدا پەیمانی بە خەلیفە دا کە پاش مردنی هەولێرو هەموو مەملەکەتەکەی رادەستی ئەو بکرێت، هەموو سەرکردەو میرانی هەولێری سوێندا کە گوێرایەڵی خەلیفە بکەنو پەیمانەکەی ببەنە سەر (مراه الزمان، ص ٧٧٧، کتاب

الحوادث، ص ٣٩ - ٤٢).

گوكبوری لە مانگی رەمەزانی ساڵی (٦٣٠ك/ ١٢٣٢ز) مرد، خەلیفە دەمودەست ژمارەیەك سەر كردەی سەربازیی توركی رەوانەی هەولێر كرد بۆ ئەوەی بەكردەوە كاروباری هەولێر وەربگرن كەچی رووبەرووی بەرگرییەكی توندی چاوەڕواننەكراو بوونەوە، میران و كاربەدەستانی قەڵای هەولێر هاودەنگ نەبوون لەسەر رادەستكردنی شارەكە، بەڵكو بۆچوون و هەڵویستی جیاوازیان هەبوو:

" میر عز الدین محەمەدی حەمیدی وای بەباش دەزانی كە هەولێر رادەستی (الملك الكامل محەمەد)ی میری میسر (٦١٥ - ٦٣٥ك/ ١٢١٨ - ١٢٣٧ز) بكرێت كە ئەو دەمانە هاتبووە ئامەد.

" كورانی میر بهاء الدین عەلی و كۆمەڵێك بەندەی توركی ئارەزوویان دەكرد بانگهێشتی الملك الاشرف موسی (٦١٥ - ٦٣٥ك/ ١٢١٨ - ١٢٣٧ز) بكەن.

" كەچی فتح الدین حەسەنی كوری كوڕ ناسراو بە (ابن كر) هەواداری خەلیفە بوو و حەزی دەكرد لەشكری بەغدا بگاتە هەولێر و شارەكە بگرێت.

ئەیوبییەكان هەولێریان بە پارچەیەك لە قەڵەمرەوی خۆیان دەزانی كە دۆستێكی دێرین و زاوایەكیان بەرێوەیدەبرد و ئەم پێشهاتەیان بەهەند وەرگرت، ئەو بوو (الملك الكامل)، هەرزوو نجم الدین ئەیوبی كوری رەوانەی هەولێر كرد و گەیشتە سەر رووباری زێی مەزن، (الملك الاشرف موسا)ش و (الملك السالح ئیسماعیل)ی برای لە شنگارەوە نارد، لەنێوان هەردوولا تێكهەڵچوون بەرپابوو تا بدر الدین لؤلؤ نێردەی بۆ هەردوولایان نارد و ناوبژییكردن و ئاشتیكردنەوە و قەناعەتی پێكردن دەستبەرداری هێرشی سەر هەولێر بن، بدر الدین ئەم كارەی لەبەر خۆشویستنی بنەماڵەی ئەیوبی نەبوو بگرە وەك مێژوونووسێك بۆیچووە لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو كە ئەو خۆشی بە چارەی ماڵباتی ئەیوبی نەدەهات و نەیدەخواست ببنە دەرهاوسێی و دەترسا مووسڵیش بگرن (تأريخ دولە الاكراد، ص ٣٩٩).

دەستبەسەردا گرتنی هەولێر خاڵێكی وەرچەخانە لە مێژووی پەیوەندی كوردی ناوچەكە بە خیلافەی عەباسییەوە و چەند ئەنجامێكی بایەخداری لێكەوتەوە كە لە پێش هەموویانەوە ئەوەیە پارچەیەكی بەرفراوانی كوردستان گەرێنرایەوە سەر قەڵەمرەوی عەباسی كەوا دیارە وێرای هەولێر وڵاتی شارەزووریش هەر خراوەتە سەر خیلافە، بەوپێیەی پارچەیەك بوو لە موڵكی كوگبوری (تأريخ العراق، ص ١٣٠).

هەروەها ئاكرێ و خەفتیان و رانییە و پشدەریش كە بە هەولێرەوە گرێداربوون و هەمووی كەوتنە دەستی خیلافە، دیارە خۆشحاڵی و گوشادی خیلافە بە گرتنی هەولێر لە سۆنگەی ئەوەوە بووە كە ناوچەیەكی بەرفراوان دەخرێتە پاڵ قەڵەمرەوی و بەمەش داهاتێكی زۆر بۆ گەنجینەی دەوڵەت دابین دەبێت، داهاتی خەلیفە (المستنصر) كە بە سەدان هەزار دینار دەخەمڵێنرا پشكێكی لە كوردستانەوە سەرچاوەی گرتبوو (تأريخ گزيده، ص ٣٦٧).

*** (گەیشتنی ئەیوبییەكان بە كوردستان):**

بۆ ماوەی سەدەیەك و زیاتریش دەڤەرە كوردنشینەكانی سەر بە مووسڵ و هەرێمی جەزیرە بەدەست ئەتابەگە توركەكان مایەوە و تەنها قەڵا و شورای سەرچیاكانیان بۆ هۆزە كوردەكان هێشتبووەوە، ئەیوبییەكان بە هاتنیان بۆ ناوچەكە سنوورێكیان بۆ باڵادەستی و تاكرەوی توركەكان دانا، سوڵتان سەلاحەددین لە درێژەی فراوانخوازییەكانی و دوای گرتنی ناوچەكانی باكووری شام لە ساڵی (٥٧٨ك/ ١١٨٢ز) بە یاوەری گەورە میرانی كورد لە رووباری فورات پەرییەوە و روهاو نەسێبین و خاپوری گرت، شنگاریش بەهۆی ئاسانكاریی میرێكی زەرزارییەوە هاتە گرتن كە نیگەهبانی یەكێك لە دەروازەكانی شاربوو، بۆ هەر شارێك والیی دانا، (ابو الهيجاء السمين) كردە والیی نەصیبین و جمال الدين خوشترینی زەرزاری كردە والیی خاپورو سعد الدين بن معين الدين ئەنری كردە والیی شنگار (مضمار الحقائق، ص ١٠٦، الكامل، ٩/ ٣٤٢، ٣٤٦، الروضتين، ٣/ ٨١).

لە دەستپێكی ساڵی (٥٨١ك/ ١١٨٥ز) سەلاحەددین بۆ جاری دووەم هاتەوە هەرێمی جەزیرە و بۆ یەكەم جار وەك سوڵتان پێی نایە خاكی كوردستانەوە و بۆ ماوەی مانگێك چواردەوری مووسڵی دا، هەر لەو ماوەیەدا دەستیكرد بە گرتنی قەڵاكانی كوردستان و بەخشینی بە میرە كوردەكان، میر سیف الدين عەلی ناودار بە المشطوب الهكاري (م ٥٨٨ك/ ١١٩٢ز) و هەڤاڵانی نارد قەڵاكانی دەڤەری هەكاری گرت كە موڵكی باب و باپیرانی بوو و كوردی ناوچەكە لە دەوری كۆبوونەوە و میرانی حەمیدیشی نارده ئاكرێ و شووشیان گرت و تا كشانەوەی سەلاحەددین لێی مانەوە (الكامل، ٩/ ٣٦٦، الروضتين ٣/ ١٤٨).

هەوڵی گرتنی مووسڵ بۆ جاری دووەم نوشستی هێنا، سەلاحەددین ئەمجارە روویكردە باكووری جەزیرە و میافارقینی لە دەست ئەرتوقییەكان دەرهێنا و رادەستی لایەنگرانی خۆیكرد و دواتر دای بە تقي الدين عومەری برازای و لە سەرەتای ساڵی (٥٧٩ك/ ١١٨٣ز) ئامەدیشی گرت و دای بە نورالدين قەرە ئەرسەلانی ئەرتوقی (٥٦٢- ٥٨١ك/ ١١٦٨ - ١١٨٥) خاوەنی حوصنكیفا و گەرایەوە مووسڵ و بە هەوڵی مجاهد الدين قایماز كێشەكە بە ئاشتی چارەكراو بەپێی رێكەوتنی نێوانیان عزالدین مەسعودی زەنگی دەستبەرداری شارەزوور بە گشت قەڵا و دێهاتەكانییەوە و هەردوو ولایەتی قەرەبولی و قەفجاقی - ناوچەكانی كەركوك و چەمچەماڵ و كۆیە و رانیە - بوو، بەم شێوەیە پارچەیەكی دیی كوردستان كەوتە دەست ئەیوبییەكان، پاش مردنی زین الدين یوسف ئەتابەگی هەولێر لە (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز) سەلاحەددین لەسەر داوای مظفر الدين كوگبوریی هاوپەیمان و زاوای هەموو ئەم ناوچانەی بۆ دابڕی و روها و حەرانی لێ وەرگرتەوە و بە تقي الدين عومەری سپارد (الكامل ٩٢/ ٣٦٩، ٤٤٧، الروضتين ٣٢/ ١٥٤).

تقی الدین عومەر بن نیازی ڕێکخستنی کاروباری ئیقتاعەتە نوێیەکانیو دابەشکردنی بەسەر میرو سەرکردەکاندا بە حەفت سەد سوارەوە ڕوویکردە هەرێمی جەزیرەو باژێری حانیی گرتو گەمارۆی خەلاتو مەنازگەردیدا، وەلێ لەناکاو نەخۆشکەوتو مرد، ناصر الدین محەمەدی کوڕی داوای لە سەلاحەددین کرد موڵكو ماڵی باوکی بۆ بهێڵێتەوە، سەلاحەددین دەیزانی ناکرێت ولایەتی سەرسنووری ئاوەها گرنگ رادەستی هەرزەکارێك بکرێتو داواکارییەکەی پەسەند نەکرد، بەهەر حاڵ بریاردرا چی ئیقتاعاتی تقی الدین هەیە لە شام بدرێتە کورەکەیو ئەوانەی جەزیرەش بە (الملك العادل) محەمەدی کوڕی ئەیوب بسپێردرێت، (الملك العادل) چووە جەزیرەو نوێنەرانو بەرپرسانی خۆی لەسەر حەرانو ڕوهاو چیای جورو میافارقینو وحانی دامەزراندو ناصر الدین محەمەد لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆ شام.

سوڵتان سەلاحەددین لە ساڵی (٥٨٩ك/ ١١٩٣ز) لە دیمەشق مردو مەملەکەتەکەی بەسەر کوڕوبرا و برازاکانی دابەشکراو بەهێزترینیان (الملك العادل) (٥٩٦ - ٦١٥ك/ ١٢٠٠ - ١٢١٨ز)ی برای بوو کە زیاتر لە شام دەمایەوەو لە ساڵی (٥٩٢ك/ ١١٩٦ز) دیمەشقو دوای چوار ساڵ میسریشی لە برازاکانی سەندەوەو دەوڵەتی یەکخستەوە.

* (لەناوچوونی ئەیوبییەکان):

ئەیوبییەکان پاش مردنی سوڵتانی سەلاحەددین گیرۆدەی شەڕو ململانێی خۆبەخۆیی بوونەوە، (الملك الصالح) نجم الدین ئەیوبی کوڕی الملك الکامل دوا شاهی بەهێزی ئەیوبییەی میسر لەگەڵ مامو ئامۆزاکانی لە شام تەبا نەبوو بەڵکو لە کێشەو رکابەرایەتیدا بوو. بروای بەدڵسۆزیو پشتیوانی میرە کوردەکان نەمابوو و بەتایبەت ئەوانەی هەوادار و لایەنگری شاهەکانی تری ئەیوبی بوون، ناچار پشتی بە ڕەگەزەکانی تر بەستو بە هەزاران بەندەی تورکیی کریو لە دەوری خۆی کۆیکردنەوەو کردنی بە دەست و پەیوەندی خۆی، تاوای لێهات زۆربەی سوپای ئەیوبییەی میسریان پێکدەهێنا (مفرج الکروب، ٦/ ٨٢ - ٨٣).

* (کوردستانو بەرایی هێرشەکانی مەغۆل
(٦١٧ - ٦٣٣ك/ ١٢٢٠ - ١٢٣٥ز):

کوردستان وەك سەرەتا بەپێی هەرێمەکانی ڕۆژهەلاتی ئیسلامی کەوتەبەر دەستدرێژییەکانی مەغۆلو هەر لە سەرەتاوە هەولێرو شارەزوورو داقوق کرانە ئامانجو مەبەستی سەرەکی خانەکانی مەغۆلو زیاتر لە جارێك پەلاماردرانو بوونە ڕێرەوی لەشکرکێشی بەرەو بەغدای پایتەخت.

حەشامەتی مەغۆل لە ماوەیەکی کورتدا هەرێمەکانی خوراسانو چیاکانو ئازەربیجانو شیروانو گورجستانو ئەرمینیایان تەنییەوە، (ابن الاثیر) کە بەخۆی هاودەمی ئەم نەهامەتییە سەرسوورمانی خۆی نەشاردۆتەوە لەوەی کە چۆن مەغۆل لە توخیبی چینو تورکستانەوە لە ماوەی کەمتر لە ساڵێك توانیان ئەم پانتاییە بەرفراوانە بپڕنو کاولی بکەنو دەڵێت ئەو کەسەی بەچاوی خۆی ئەو ڕاستییەی نەبینیبێت ناستەمە بروا بکات (الکامل، ٩/ ٦٨١ - ٦٩٣).

جەنگاوەرانی مەغۆل بەدەم ڕاونانی علاءالدین خوارزم شاوە گەیشتنە ڕەیو هەمەدانو زنجانو قەزوێن، سەرماوسۆڵەو بەفرو باهۆزی زستان تەنگاوی کردنو بەناچاری چیاکانیان چۆڵکردو ڕوویانکردە ئازەربیجانو موقانو لە کەنارەکانی دەریای قەزوێن لەنگەریان گرت، ئەوان عەودالی جێگای گەرمەسێر و لەوەرگا بوون بۆ مەڕوماڵاتەکانیان، پاشان ڕووەو گورجستان ملیاننا.

لە ساڵی (٦١٨ك/ ١٢٢١ز) لە گورجستانەوە داکشانەوەو شاری مەراغەیان گرتو تالانیانکردو کەوتنە ڕەشە کوژی، ئەمجا ڕووەو ناوجەرگەی کوردستان ملیاننا بەنیازی گرتنی هەولێر، مظفر الدین کوگبوری یەکسەر خەلیفە الناصرو بدر الدین لؤلؤی لە نزیکبوونەوەی مەغۆل بە ئاگاهێنایەوە و داوای کۆمەك و پشتیوانی لێکردن، خەلیفەش گەورە نۆکەری خۆی جمال الدین قشتمەری ڕاسپارد بە هێزێکی هەشت سەد سوارەوە بە هاوار کوگبورییەوە بچێتو ولە هەمووانی خواست لە داقوق گردببنەوە، داوای لە الملك الاشرف موسای ئەیوبییش کرد بەدەنگیانەوە بێتو هاریکاریان بکات، پاشای ئەیوبی نەدەشیا بەدەنگ خەلیفەوە بێت چونکە لەگەڵ الملك الکامل محەمەدی برایدا سەرقاڵی خۆئامادەکردن بوون بۆ بەرپەچدانەوەی فەرەنجە (الکامل، ٩/ ٦٩٥).

کوگبوری دڵنیابوو لەوەی کە لە شیانیدا نییە بەر بە مەغۆل بگرێت، ئەوانیش نەیاندەویست زیاتر پێشڕەوی بکەنو کاتێك بە گردبوونەوەکەی داقوقیان زانی گەڕانە دواوەو پەلاماری هەمەدانو ئەردەبیلو بەیلەقانیان دا وکەوتنە گیانی دانیشتووانو بەهەزاران خەڵکیان کوشتو سەدان گوندو دێهاتیان سووتاند (الکامل، ٩/ ٦٩٧ - ٦٩٨).

لەسەرەتای ساڵی (٦٢١ك/ ١٢٢٤ز) کۆمەڵێکی تری مەغۆل بە بریاری جەنگیزخان هاتنەوە چیاکانو گەیشتنە هەمەدانو لەوێوەش پێشڕەویانکردو چیاکانی کوردستانیان بڕیو دەربازی دیوی هەولێربوون، هەرچەند لە ئاخاوتنی (ابن الاثیر) وا دەردەکەوێت لە هەمەدان بەملاوە نەهاتوون (الکامل ٩/ ٧٢٧).

لە تێکهەڵچوونێکدا لە مانگی شەوال لە (مرت - مامەڕووت)؟ خەڵکێکی زۆریان کوشت لەوانەش فەرموودە ناسو شاعیرێکی کەرکوکی بەناوی ابو سلیمان عبدالرحمن بن ابی بکر البلخی الکرخینی (ابن الشعار، قلائد الجمان، ٣/ ٣٣٨). لە ساڵی (٦٢٨ك/ ١٢٣١ز) تەوژمێکی تری مەغۆل لە تەوەری مەراغەوە گەیشتنە کوردستان، جلال الدین منکبرتی کە لە ئۆرمێو شنۆ بارگەی خستبوو ئارامی لەبەر براو پەنای بردە بەر شاری خەلاتو خۆی گەیاندە لای جێگری الملك الاشرف موسای ئەیوبی لە شارەکە، مەغۆلیش بە هەزاران هەر بەدوایەوە بوونو گوند بە گوندو باژێر بە باژێر ڕاویاندەناو دەیانویست بە دەردی علاء الدین خوارزم شاهی باوکی ببەنو بیکوژن، لە ئاکامی ئەم لەشکرکێشییە

شارەکانی ئامەد، ئەرزن، میافارقین، سێرت، تەنزە، ماردین، نەصیبین، شنگار، خەلات، بەرگیری، ئەرگیش، یەکە یەکە بەرهێرشی کوشندەی لەشکری بێشوماری مەغۆل کەوتن‌و دانیشتووانەکانی دووچاری کوشتن‌و تالانکردن‌و ئازاردان هاتن، ستەم‌و بێدادیی لەرادەبەدەریان دەرحەق ئەنجامدرا، مەغۆل رەشەکوژییان دەکردو سڵیان لە هیچ نەدەکردەوە، بازرگانێك کە شیابوو لە شمشێری مەغۆل خۆی رزگاربکات گێرابوویەوە کە تەنها لە ئامەد زیاتر لە پازدە هەزار لاشەیان ژماردبوو، خەڵکەکە بەشێوەیەك پەشۆکاوو تۆقیبوون‌و ورەیان رووخابوو، زاتیان نەدەکرد لە مەغۆل بێنە دەنگ‌و دەست بکەنەوە، چیرۆك‌و بەسەرهاتی وا دەماودەم دەگێردرانەوە کە هەر کەسێك گوێبیستی بوایە لەوانەیە بەهەڵبەستراوی دابنایە (الكامل، ٩/٧٩٣ – ٧٩٧).

لەسەرەتای ساڵی پاشتر بە شارەزوورو گەرمیاندا بڵاوبوونەوەو هەواڵی هاتنیان گەیشتە بەغدا، کوگبوری لای خۆیەوە داوای کۆمەکی‌و پشتگیری لە خەلیفە (المستنصر) کرد، خەلیفەش بانگەوازی بۆ گشت لایەنەکان کردو تکای خۆئامادەکردنی لێکردن‌و هێزێکی بەهانای کوگبورییەوە نارد، سەرەنجام لەشکر لە نزیك (الكرخيني – كەركوك) کۆبوونەوەو چەند مانگێك مانەوە، لەم کاتەدا برێك لە مەغۆلەکان بایانداییەوە بەلای شارەزووردا‌و چیا سەخت و تووشەکانی دەربەندیان[٤٠] بریی‌و گەیشتنە سامیان[٤١]، کوگبوری‌و یاوەرانی لە کەرکوکەوە بەرێکەوتن‌و گەیشتە شوێنێك بەناوی (الاكراد)[٤٢] و ئەمجا رێگای شارەزووریان گرتەبەر و گەیشتنە گوندی موغان[٤٣].

لەم کاتەدا مظفر الدين کوگبوری نەخۆشکەوت‌و گوندی موغانیش لەبەر بێ ئاوی بۆ حەوانەوە دەستینادا، بۆیە هەموویان رێککەوتن بە هێمنی‌و بیدەهۆڵ کوتان‌و مۆم هەڵکردن بکێشنەوە (شهر كرد – الاكراد) و لەوێ سەنگەر لێبدەن‌و لە ئامادەباشی دابن.

ئەوەی جێگەی تێبینییە ئەم هێرشانەی مەغۆل بێ بەرنامەو هەرەمەکی بوون‌و زیاتر مەبەستیان تاقیکردنەوەی وزەو شیانی خۆیان‌و چاوترساندنی بەرانبەریان بوو، بۆ ئەوەش بوو بزانن ئایا کەس هەیە پێشیان لێبگرێت‌و هێزو توانای دەوڵەتانی ئیسلامی چەندەو تاچ رادەیەك تاقەتی بەرگرییان هەیە، ئەمجارەش ئەوەندە نەمانەوەو گەرانەوە ئازەربیجان، سەرکردەکانی لەشکرەکەی شەهر کوردیش چیدی نەچوونە پێش‌و نەیاندەویست هەڵپە بکەن‌و خۆیان گیرۆدەی داوی مەغۆل بکەن، دوای وردە تێکهەڵچوونێك بێشەر بڵاوەیان لێکرد (تأريخ الزمان، ص ٢٧٨، كتاب الحوادث، ٤٨ – ٥٢).

* (**هێرشەکانی مەغۆل لە ماوەی** (٦٣٥ – ٦٥٠ك/ ١٢٣٧- ١٢٥٢ز):

خانەکانی مەغۆل ئوگتایی کوری جەنگیزخان (٦٢٤ – ٦٣٩ك/ ١٢٢٧ – ١٢٤١ز)و کیوکی کوری ئۆگتای (٦٤٤- ٦٤٧ك/ ١٢٤٦ز – ١٢٤٩ز)و مەنگوقائانی کوری تولویی کوری جەنگیزخان (٦٤٧ – ٦٥٨ك/ ١٢٤٩ – ١٢٦٠ز) پیادەی هەمان سیاسەتی جەنگیزخانیان دەکردو هەر گاف فەرمانیاندەدا گوشار بخرێتە سەر سنوورەکانی خیلافەی عەباسی‌و ناوچەکانی سەر بە ئەیوبییەکان‌و ئەتابەگەکانی مووسڵ‌و ماردین لە هەرێمی جەزیرەو سەربازانی مەغۆلییان رادەسپارد ترس‌و لەرز بخەنە ناودڵی خەڵکییەوەو دەسەڵاتداران هەراسان بکەن‌و تەنگەژەو ئاریشەیان بۆ بنێنەوە، بۆیە بەیناوبەین گێچەڵی مەغۆل سەریهەڵدەدایەوەو هێمنی‌و ئارامییان دەشڵەژاندو هەرجارە ناوچەیەکیان دەکردە ئامانج، جگە لە تەوەری مەراغە – هەولێر تەوەری کرماشان – دەرتەنگ – خانەقین بەرەو بەغداشیان تاقیکردەوەو لێرەوە مەترسیان کاریگەرتر بوو بەوپێیەی راستەوخۆ بەغدا دەبووە مەبەست، ساڵ بە ساڵ فشاری مەغۆل پەرەی دەسەندو هێرشەکانیان توندترو فراوانتر دەبوو.

لە مانگی سەفەری ساڵی (٦٣٥ك/ ١٢٣٧ز) دا شەپۆلێکی تری مەغۆل سەرلەنوێ هەڵیانکوتایە سەر هەولێر، خەڵکەکە زانییان خۆحەشاردان لە قەڵا دادیان نادات‌و شاریان چۆڵکرد، شمس الدين باتكين بەرپرسی سەربازی هەولێر هێزەکانی هێنایە دەرەوەو لە چواردەورەی شار ئێشکی گرت، خۆشبەختانە ئەم شەپۆلەیان هەولێریان بواردو زیاتر مەبەستیان داقوق‌و دەڤەرەکانی نزیك بەغدا بوو، ئەوەبوو داقوقیان تالانکردو لە نزیك چیای حەمرین گیرسانەوەو خەڵکی داقوق بەهەڵەداوان دادی خۆیان گەیاندە بەغدا.

لە بەغدا بانگەوازی جیهاد خوێندرایەوەو خەڵکی شپرزەبوون‌و ترسیان لێنیشت، خەلیفە (المستنصر) گەورە سەرکردەو بەرپرسانی کۆکردەوەو راوێژی پێکردن، بریاردرا سوپایەك بنێرن بەر سینگی مەغۆل بگرێت، عمادالدين زەنگی خودانی شارەزووریش بەهێزێکەوە ئامادەبووو بە هەمووان لە مەغۆل هاتنەدەست‌و توانیان لە نزیك چیای حەمرین پێشرەوییان پەکبخەن‌و برێکیان لێبکوژن سامان‌و دەواریان تالان بکەن‌و دیلەکانی هەولێرو داقوقیان لە چنگ دەربهێنن‌و پەرتەوازەیان بکەن (تأريخ الزمان، ص ٢٨٥، جامع التواريخ، ٥٧٥ – ٥٧٦، كتاب الحوادث، ص ١٣٧– ١٣٩).

خانەکانی مەغۆل سووربوون لەسەر هەراسانکردنی خەلیفەو وازیان لە جموجۆڵ نەهێناو دەستبەرداری سیاسەتی هێرشبردن‌و کشانەوە نەبوون‌و کتوپڕ پەلاماری ناوچەیەکیان دەداو لەگەڵ گەیشتنی سوپا لە بەغداوە بە تالان و دەستکەوتەوە دەگەرانەوە دواوە، هەر لەگەڵ بڵاوە لێکردنی سوپای بەغداش سەرلەنوێ شاڵاویان دەهێنایەوە، ئەوە بوو دوای کشانەوە لە چیای حەمرین ئەوەندەی نەبرد نزیکەی پازدە هەزاریان لە تەوەری خانەقینەوە دزەیانکردو لە بەغدا نزیك بوونەوەو کۆمەڵێکیان لە شارەزووردا بڵاوبوونەوە.

خەلیفەی عەباسیش بانگەوازی بۆ فەرمانرەوایانی موسڵمانان کرد، ئەوەبوو سێ میری ئەیوبی فریاکەوتن‌و بەسەدان سوارەوە بە هاوارەوە هاتن، لە رووبەڕووبونەوەیەکدا لە گەلییەکی نزیك خانەقین سوپای بەغدا کەوتە بۆسەی مەغۆلەوەو زیانێکی مەزنیان بەرکەوت‌و زۆربەیان لە برسان‌و لە تینوان گیانیان لە دەستداو ژمارەیەك فەرماندەی

سەربازی کوژران کە یەکێکان میر بهاء الدین عەلیی هەولێری بوو، خەڵکی مەندەلیو ڕێگای خوراسان ماڵوێرانو دەربەدەربوونو هێزەکەی مەغۆلیش بەدەستکەوتەوە کشانەوە (تأریخ الزمان، ص ٢٨٥، جامع التواریخ، ص ٦٠٦. کتاب الحوادث، ١٣٩- ١٤٢).

لە ساڵی (٦٤٧- ١٢٤٩ز) کۆمەڵێکیان لە چیاکانی کوردستانەوە شۆڕبوونەوەو دزەیانکردە ئەیوانی خانەقین، ئەمجا بەرەو ڕانکاوا، زانگاوا، زەنگاباد[٤٤] ڕۆیشتنو چوون بەگژ خەڵکی بێ تاوانداو سەروەتو سامانیان تاڵانکردنو کەوتنە ڕەشبگیریو بێدەربەستانە لە ڕێگای دەرتەنگەوە گەڕانەوە، لە ساڵی (٦٥٠ك/ ١٢٥٢ز) کۆمەڵێکی تری مەغۆل کتوپڕ پەلاماری کوردەکانی چیاکانیانداو هەندەی پێیانکرا سڵیان لە کوشتنو گرتنو شەلاندن و ڕفاندن نەکردەوە (وقتلوا واسروا ونهبوا وسبوا) پاشان بە هەمان شێوە کشانەوە پایەگاکانیان لە ئازەربیجان (جامع التواریخ، ص ٦٠٦، کتاب الحوادث، ص ٢٨٥ - ٢٨٦، ٣٠٤).

*پەراوێزەکان:-

١ بڕوانە: تأریخ خلیفه، ص ١٢٧، البلاذري، فتوح البلدان، ص ٢٦٤ - ٢٦٥، الدینوري، الاخبار الطوال، ص١٢٢ - ١٢٣. تأریخ الیعقوبي، ٢/١٠٤، تأریخ الطبري، ٤/ ٢٤- ٢٧.

٢- دایکی تابعیی ناودار عامر بن شراحیل الشعبي (٢١-١٠٤ك ٦٤٢ - ٧٢٣ز) یەکێك بوو لە ئافرەتە ڕفێندراوەکان، سەبارەت بە مێژووی لە دایکبوونی الشعبي هەواڵی جۆربەجۆر هەیە، بەخۆی دەیگوت لە ساڵی جەلەولا - ١٩ك لە دایکبوومە (ابن خلکان، وفیات الاعیان، ١٢/ ١٥).
هەر لە ئاکامی پرۆسەی فەتحکردنی وڵاتانو کۆکردنەوەی تاڵانیدا، خەلیفەکانو هەڤاڵانی پێغەمبەر (د.خ)و تەنانەت ئەوانەی (العشره المبشره) بوونە ملیۆنێرو خاوەند کۆشكو تەلارو عەقاراتو سەدانو هەزاران سەر ئەسپو هوشترو مەڕو کۆیلەو بەندە، هەر بۆ نموونە خەلیفە عوسمان لە ڕۆژی کوشتنیدا (١٥٠٠٠٠) دینارو ملیۆنێك درهەمو بایی (١٠٠٠٠٠) دینار موڵکی هەبوو وێرای ئەسپو هوشترێکی زۆر، الزبیر بن العوام: (٥٠٠٠٠) دینارو (١٠٠٠) ئەسپو (١٠٠٠) بەندەو جاریەی لە پاش بەجێما، عبدالرحمن بن عوف: (١٠٠) ئەسپو (١٠٠٠) هوشترو (١٠٠٠٠) سەر پەزی هەبوو، لە پاش خۆی چوارییەکی هەشتیەکی (ربع ثمن- ١/ ٣٢)ی سامانەکەی (٨٤٠٠٠) دینار بوو، طلحة بە عبدالله: داهاتی ڕۆژانەی تەنها لە عێراقدا (١٠٠٠) دینار بوو، بەهەمان شێوە: سعد بن ابی وقاصو زید بن ثابتو المقداد بن الاسود... هتد (المسعودي، مروج الذهب، ٢/ ٣٣٢- ٣٣٣).

٣- بۆ پتر پێزانین دەربارەی بانگەشەی عەباسی بڕوانە: مؤلف مجهول، اخبار الدولة العباسیة، دار الطلیعة (بیروت: ١٩٧١)، الاخبار الطوال، ص ٣١٠ - ٣١٥، فاروق عمر فوزي، طبیعة الدعوة العباسیة (بغداد، ٢٠٠٢).

٤ هەر بۆ نموونە بڕوانە: فتوح البلدان، ص ٣١٧، تأریخ الطبري، ٨/ ٥٥، ٩/ ١٤٠، الکامل، ٥/ ٤٧٥، ٦/ ٣٢٠، ٨/ ٦٢٧.

٥ بڕوانە لێکۆڵینەوەیەکم بەناونیشانی: وێنەی مێژوویی کورد لە ئەدەبیاتی عەرەبیدا، گۆڤاری زانکۆی کۆیە، ژمارە (١٣)، ساڵی (٢٠٠٩)، ل ٨٥ - ١٢٢).

٦ (تجارب الامم، ٥/ ١٥٧ - ١٦٢، ١٧٣، ٢٧٥ - ٢٧٦، الکامل، ٦/ ٤٣٦ - ٤٣٨، ٤٤٩- ٤٥٠، ٥١٢، الاربلي، خلاصة الذهب المسبوك، ص ٢٤٨، ٢٦٥).

٧- بۆ پتر پێزانین دەربارەی دەوڵەتی بوەیهی بڕوانە: د.محمد حسین الزبیدي، العراق في العصر البوەیهي، دار النهضة العربیة (القاهره، ١٩٦٩).

٨- بۆ پتر پێزانین دەربارەی پەیوەندی کوردو بوەیهی بڕوانە: قادر محمد حسن، الامارات الکردیه فی العهد البویهي، مؤسسة موکریاني (اربیل ٢٠١١).

٩- لە هەموو سەرچاوە عەرەبییەکاندا ناوی ئەم هۆزە بە (الذبانیة) هاتووە، لە هەندێکیاندا بە هەڵەی ڕوونووسکاران کراوە بە (الهذبانیة) یان (الهدبانیه)... دوور نییە پەیوەندی هەبێت بە وشەی (هۆزەبان - هۆزەڤانەوە) بەواتای

سەرۆکهۆز، هەروەها زۆر نزیکە لە وشەی ئەزبەنی بە واتای گەورەم، مێنۆرسکی پێی وایە هەزەبانی لە (حدیاب)ەوە وەرگیراوە کە ناوی دێرینی دەڤەری هەولێرە.

١٠- مێژوونووسی عوسمانی احمد بن لطف الله ناودار بە منجم باشی کتێبێکی گەورەو گرانبەهای بە ناوی (جامع الدول) داناوەو بەشێکی بۆ میرنشینی شەدادی تەرخانکردووە کە وەك خۆی ئاشکرای دەکات لە سەرچاوەیەکەوە وەریگرتووە بە ناوی (تأریخ الباب والابواب) کە نزیکەی ساڵی (٥٠٠ك/ ١١٠٦ز) نووسراوەو نووسەرەکەی بە فقیە خۆی ناساندووە. تا ئێستا کتێبی (جامع الدول) دەستنووسەو بڵاونەکراوەتەوە، مینۆرسکی دەقی ئەو بەشەی دەربارەی شەدادییەکانە (باب في الشدادية) وەك پاشکۆ لە کتێبەکەی چەند لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی مێژووی قەفقاز بڵاوکردۆتەوەو دەڵێت: (ئەم بەشەی تأریخ الباب والابواب) لە ساڵی (٤٦٨ك/ ١٠٧٥ز) نووسراوە. لە پێش ئەو بەشەی کە سەبارەت بە شەدادییەکانە لە چەند لاپەرەیەکدا باس لە زنجیرەی میرانی رەوادیش کراوە، کەچی ئەم لاپەرانە لە وەرگێڕاوی کورتکراوەی تورکیدا کە بە ناوونیشانی (صحائف الاخبار) لە ساڵی (١٨٨٠ز) چاپکراوە لابراوە، مینۆرسکی لە رێگەی برادەرێکەوە ئەو لاپەرانەی دەستکەوتووەو لە کتێبەکەی بڵاویکردووەتەوە (تأریخ قفقاز، ص ٢٤٠ - ٢٤٣).

١١- التنوخي (م ٣٨٤ك/ ٩٩٤ز) لە میانەی گێڕانەوەی ئەو چیرۆك و بەسەرهاتانەی لە مەر رێگریی کوردانەوە بڵاوبونەتەوە ناوی دوو رێگری کوردی هێناوە (بهزاد الکردي، ابن سباب - ابن سیار) ابن مردانیش هەیە، نازانرێت پەیوەندی ئەمانە بە (ابو الشوك)ەوە چییە (الفرج بعد الشدة، ٤/ ٢٣٠ - ٢٣١، ادم متز، الحضارة الاسلامیة، ٢/ ٤٠٠).

١٢- خانیجار بە خان القیر لێکدراوەتەوە بەڵام خانیجار لە کانی هەنجیرەوە نزیکە، یاقوتی حەمەوی دەڵێت ناوێکی عەجەمییە واتە ناعەرەبییە (معجم البلدان، ٢/ ٢١١)، لە راستیشدا هەروایە، خانی - هانی تا ئێستاش بەزاری هەورامی بە واتای کانی دێت، صدخانیە لە هەرێمی چیاکان کە لە یاداشتی گەرۆکە موسڵمانەکان تۆمارکراوە بە (مئە عین) واتە سەد کانی وەرگێردراوە، جار - ژار هەر کورتکراوەو سواندنی هەژیرە.

١٣- سەندە یان سندە قەڵایەکە لە چیاکانی هەمەدان (معجم البلدان، ٣/ ٨٢)، بە دووری نازانین مەبەست قەڵایەکی نزیك شاری سنە بێت کە بە فارسی بە سنندج - سنندژ دەناسرێت واتە قەڵای سندە لە کوردیدا سواوە بۆ سنە وەك چۆن بەغداد بۆتە بەغدا.

١٤- سێ میری عەنازی بە (ابن ابی الشوك) دەناسران، یەکەمیان میری دامەزرێنەرو باپیرە گەورەی عەنازییەکانە، دووەمیان سوعدایە، سێیەمیشیان سروخابی کوری بەدرە، ئەو میرەی لەو رێورەسمەدا ئامادەبوو بە (ابن ابی الشوك) ناوبراوە کە دەبێت مەبەست میر سورخاب بێت، چونکە ئەو و باوکی هەوادارو لایەنگری سەلجوقییەکان بوون و لە گەڵیان دەچوونە بەغداو سورخاب هەر یاوەری توغرلبەگ بوو (مراه الزمان، ص ٢٠٩)، هەرچی میر سوعدایە هەر ئەمبەرو ئەوبەری دەکردو جێگەی باوەری توغرلبەگ نەبووو دواجار پەیوەندی کرد بە بوەیهییەکانەوە.

١٥- لە رووداوەکانی سەرەتای سەدەی ٦ك/ ١٢ز باس و خواسی میرێك دێت بە ناوی مهلهل الکردي (زبده النصره، ص ٢٣٨، المنتظم، ١٧/ ٢٠٩، الکامل، ٨/ ٦٢٥) ئەم میرە شازنجانی نییە بەڵکو گاوانییە و ناوی تەواوی (ضیاء الدین مهلهل بن ابی العسکر الکردي الجاواني)یە.

١٦- بۆ نموونە بەدری کوری موهەلهەلی کوری ابو الفتح حەمەدی کوری عەنازی کوری ابو الشوك الکردي، کورتکراوەتەوە بۆ بەدری کوری موهەلهەلی کوری ابو الشوك الکردي، مرآة الزمان، ص ١٧٢، تأریخ ابن ابی الهیجاء، ص ٢٠٠.

١٧- دەربارەی کێشە ناوخۆییەکانی سەلجوقییەکان بگەرێوە بۆ: الکامل، ٨/ ٣٥٥، ٣٥٩، ٣٥٩ - ٣٦٢، ٣٦٨ - ٣٧٠، ٣٧٧، ٤٠٨ - ٤٠٩، ٤١٤- ٤٢٤، ٤٣٦ - ٤٤٠، ٥٨٢ - ٥٨٤، ٥٨٨- ٥٩٢.

١٨- بروانە: دائرة المعارف الاسلامیة، ١/ ٤٢٣، محسن محمد حسین، اربیل في العهد الاتابکي، ص ٢٥- ٢٦.

١٩- تأریخ الفارقي، ٢/٢٤٢، الباهر، ص ٧٩، ٨٤، الکامل، ٨/ ٧٣٧، الروضتین، ١/ ١٨٥- ١٨٦، مفرج الکروب، ١/ ٩٧.

٢٠- الکامل، ٩/ ٣٢٧، ٣٠٤، مفرج الکروب، ٢/ ٩٣، الغساني، العسجد المسبوك، ص ١٨٠.

٢١- دەربارەی مجاهد الدین قایماز بروانە: اربیل في العهد الاتابکي، ص ٦٠ - ٦١.

٢٢- راحة الصدور، ص ٢٣٣، ٢٨٣، زبده التواریخ، ص ٢٢٠، ٢٥٥، مسالك الابصار، ٣/ ٢٦٢.

٢٣- ابن شداد، النوادر السلطانیة، ص ٣٤١، مجمع الاداب، ١/ ١٥٤ - ١٥٥.

٢٤- راحه الصدور، ص ٣٥٦، ٣٦٢، زبده التوارخ، ص ٢٩٦- ٢٩٧، تأریخ دولة الاکراد، ص ٢٢٣.

٢٥- النوادر السلطانیة، ص ٣٢٣، ٣٤١ - ٣٤٢، الکامل، ٩/ ٤٤٧، الروضتین، ٤/ ٣٨.

٢٦- الکامل، ٨/ ٦٥٢، تاریخ اربل، ١/ ٢٧٣، تأریخ ابن ابی الهیجاء، ص ٢١٨.

٢٧- پەرچەم لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا بە برجم هاتووەو لە هەندێك دەقدا شێوێنراوە بۆ ترجم، کاشغەری (م ٤٦٦ك/ ١٠٧٣ز) لە پەرتووکی (دیوان لغات الترك) دەڵێت پەرچەم بە زمانی تورکە غوزەکان پارچەیەکە لە ئاوریشم یان لە کلکی چێڵی کێوی جەنگاوەران لە کاتی جەنگدا دەیانپووشی، محمد عبدالوهاب قزویني، دیڤچوونێکی وردی دەربارەی تورکمانی ئەیوائی و سلێمانشاهی کوری پەرچەم نوسیووە، بروانە: تأریخ جهانگشای، ٣/ ٤٥٣- ٤٦٣.

٢٨- ابن الساعي، الجامع المختصر، ص ١٣٠، ٢٦٤، مجمع الاداب، ٢/ ٥١٥، العسجد المبسوك، ص ٦٣٤.

٢٩- رۆژێکیان وشەی دقوق لە دەمی سنقر الطویل دەرکەوت و داقوق بە تورکی واتە مریشك، خەلیفە الناصر وا تێگەیشت داقوقی دەوێت و یەکسەر بۆی دایبڕی.

٣٠- الجامع المختصر، ص ١٣، ٢٨- ١٩، مجمع الاداب، ٣/ ٢٨٣ - ٢٨٤، كتاب الحوادث، ص ٢٥٦.

٣١- العمادالاصفهانی، البستان الجامع، ص ٤٢٥، ٤٢٢، النوادر السلطانية، ص ١٤٦، الكامل، ٩/ ٣٧١.

٣٢- مێژوونووسی نەناسراوی خەڵکی ڕوها لە ژێر ناونیشانی (ئەو جەنگەی وا تورکمان لە دژی کوردان بەرپایانکرد) لەمەڕ ئەم ڕووداوە دواوە، تأريخ الرهاوي المجهول، ص ٢٢٥.

٣٣- تأريخ مارميخائيل، ٣/ ٣٦٧ - ٣٦٨، تاريخ الرهاوي، ص ٢٢٥.

٣٤- بڕوانە: اربيل في العهد الاتابكي، ص ٧٩ - ٨٥.

٣٥- بڕوانە: مرآة الزمان، ص ٧٧٨ - ٧٧٩، اربيل في العهد الاتابكي، ص ١٨٧ - ٢٠٦.

٣٦- وبقي غصة في حلق البيت الاتابكي لايقدرون علي اساغتها (الكامل، ٩/ ٤٤٨).

٣٧- بڕوانە: الكامل، ٩/ ٦٦٣، ٧٢٠، ٧٤٩، الذيل علي الروضتين، ٥/ ١٧٣.

٣٨- بڕوانە: ابن نظيف الحموي، التأريخ المنصوري، ص ٨٩، وفيات الاعيان، ٥/ ٢٠٨، كتاب الحوادث، ص ١٣٩، ١٩٤، اربيل، ص ١٢٣- ١٢٤).

٣٩- پشدەرو ڕانیە، وابزانم کەس لەو باوەڕەدا نەبوو کە هەردوو پەیڤی ڕانیەو پشدەر هەندە دێرین بن و لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە ناوی هەمان ئەو دوو شوێنە بن، وەلێ مەخابن بە ئاگادرای ئێمە تەنها لەو هەواڵەدا ناویان تۆمارکراوە.

٤٠- دیارە لێرە مەبەست لە دەربەندی مەزنە کە دەکەوێتە سەر ڕێگای هەولێر - ئازەربیجان، بڕوانە: نزهة القلوب، ص ١٦٣، مسالك الابصار، ٣/٢٦٥.

٤١- دوور نییە سامیان هەر السامغان - الصامغان بێت کە لە ڕۆژگاری فتوحاتەوە ناوی هاتووە.

٤٢- ناوی ئەم شوێنە لە کتێبی جارێك بە (الأكراد) و جارێکی تر بە (شهر کرد- شاری کورد) ناوی هاتووەو بێگومان هەر مەبەست شەهر کورد -شاری کوردە- کە گوندێك بوو نزیك کەرکوك بە ئاراستەی داقووقدا لە سەرچاوە سریانی و عەرەبییەکاندا ناوی هاتووە. بڕوانە: ابن الشعار، قلائد الجمان، ٤/ ١٥٢.

٤٣- دەبێت هەر گوندی موان بێت کە دەکەوێتە دەستەڕاستی ڕێگەی عەربەت - سید صادق لە پارێزگای سلێمانی، موغان سواوەو بۆتە موان.

٤٤- ناوی ئەم شوێنە لە (كتاب الحوداث، ص ٢٨٥) (بەرانکاو - زانکاوا)؟ هاتووە، و لای (ابن العبري) (تأريخ الزمان، ص ٢٨٥ بە زەنگابادو لە (نزهة القلوب، ص ٨٣) بە زەنگیاباد هاتووەو مەبەست زەنگابادە، زانکاوە نزیکە لە شێوە کوردییەکەی زەنگاواد.


* سەرچاوەکان بە زمانی عەرەبی:-

- ابن ابي الهيجاء، عز الدين بن ابي الهيجاءالهذباني (ت ٧٠٠ھ/ ١٣٠٠م).
- تأريخ ابن ابي الهيجاء، طبع مع القضاعي (بيروت: ٢٠٠٤).
- ابن الاثير، عزالدين علي بن محمد الشيباني (ت ٦٣٠ھ/ ١٢٣٢م).
- التأريخ الباهر في الدولة الاتابكية، دار الكتب الحديثة (القاهرة: ١٩٦٣).
- الكامل في التأريخ، دار المعرفة (بيروت: ٢٠٠٧).
- الاربلي، عبدالرحمن سنبط بن قنيتو (ت ٧١٧ه/ ١٣١٧م).
- خلاصة الذهب المسبوك، تحقيق: مكي السيد جاسم، ط٢ (بغداد: ١٩٦٤).
- الازدي، ابو زكريا يزيد بن محمد بن اياس (ت ٣٣٤ه/ ٩٤٦م)
- تأريخ الموصل، تحقيق علي حبيبة (القاهرة: ١٩٦٧).
- اسامة بن منقذ، اسامة بن مرشد بن علي الشيزري (ت ٥٨٤ه/ ١١٨٨م).
- كتاب الاعتبار، المكتب الاسلامي (دمشق: ٢٠٠٣).
- الاسفراييني، عبدالقهاربن طاهر البغدادي (ت ٤٢٩ه/ ١٠٣٨م).
- الفرق بين الفرق، دار الافاق الجديدة (بيروت: ١٩٧٧).
- الاصطبخري، ابراهيم بن محمد الفارسي (ت بعد ٣٤٠ه/ ٩٥١م).
- المسالك والممالك (القاهرة: ١٩٦١).
- الانطاكي، يحيي بن سعيد بن يحيي (ت ٤٥٨ه/ ١٠٦٥م).
- تأريخ الانطاكي، المعروف بصلة تأريخ اوتيخا (طرابلس: ١٩٩٠).
- ايليا برشينايا (ت ٤٣٨ه/ ١٠٤٦م).
- تأريخ ايليا برشينايا، عربة: يوسف حبي، مطبعة الاديب (بغداد: ١٩٧٥).
- ابن بشكوال، ابو القاسم خلف بن عبدالملك (ت ٥٧٨ه/ ١١٨٢م).
- كتاب الصلة، المكتبة العصرية (بيروت: ٢٠٠٩).
- البلاذري، ابو الحسن احمد بن يحيي بن جابر (ت ٢٧٩ه/ ٨٩٢م).
- انساب الاشراف، دار الفكر (بيروت: ١٩٩٦).
- فتوح البلدان، دار الكتب العلمية (بيروت: ١٩٧٨).
- البيروني، ابو ريحان محمد بن احمد (ت ٤٤٠ه/ ١٠٤٨م).
- الجماهر في الجواهر، تحقيق: يوسف الهادي (تهران: ١٩٩٥م).
- ابن البيطار، ضياء الدين عبدالله بن احمد المالقي (ت ٦٤٦ه/ ١٢٤٨م)
- الجامع لمفردات الادوية والاغذية، دار الكتب العلمية (بيروت: ٢٠٠١).
- البيهقي، ابو بكر احمد بن الحسين (ت ٤٥٨ه/ ١٠٦٦م)

- سنن البيهقي الكبري، مكتبة دار الباز (مكة المكرمة، ١٩٩٤).
- التنوخي، همام بن الفضل بن جعفر (ت ٣٨٧ه/ ١٩٩٧م)
- تأريخ همام، نشرة د.احسان عباس ضمن كتاب شذرات مفقودة في التأريخ، دار الغرب الاسلامي (بيروت: ١٩٨٨).
- ابن الجوزي، ابو الفرج عبدالرحمن بن علي (ت٥٩٧ه/ ١٢٠٠م)
- المنتظم في اخبار الملوك والأمم، دار الكتب العلمية (بيروت: ١٩٩٥). الجوهري، ابوبكر احمد بن عبدالعزيز البصري (ت٣٢٣ه/ ٩٣٥م).
- السقيفة وفديك برواية ابن ابي الحديد (ت ٦٥٦ه/ ١٢٥٨م) تحقيق الشيخ محمد هادي الاميني، شركة الكتبي للطباعة والنشر (بيروت: بلا).
- الجهشياري، ابو عبدالله محمد بن عبدوس (ت ٣٣١ه/ ٩٤٣م).
- الوزراء والكتاب (القاهرة: ١٩٣٨).
- الحازمي، محمد بن موسى بن عثمان الهذاني (ت ٥٨٤ه/ ١١٨٨م).
- كتاب الاماكن، موقع www. Alwarraq. Com
- ابن حبان، ابو حاتم محمد بن هبان بن احمد (ت ٣٥٤ه/ ٩٦٥م).
- صحيح ابن حبان، مؤسسة الرسالة (بيروت: ١٩٩٣).
- الثقافة، دار الفكر (بيروت: ١٩٧٥).
- ابن حبيب، ابو جعفر محمد بن حبيب (ت ٢٤٥ه/ ٨٦٠م).
- اسماء المغتالين من الاشراف، نشرة د: عبدالسلام محمد هارون ضمن المجموعة السادسة من نوادر المخطوطات (القاهرة: ١٣٧٤ه).
- ابن حجر العسقلاني، شهاب الدين احمد بن علي (ت ٨٥٢ه/ ١٤٤٨م).
- تهذيب التهذيب، دار الفكر (بيروت: ١٩٨٤).
- ابن حزم، علي بن احمد بن سعيد الاندلسي (ت: ٤٥٦ه/ ١٠٦٤م).
- جمهرة انساب العرب، دار الكتب العلمية (بيروت: ١٩٨٣).
- الحسيني، صدر الدين علي بن ناصر (ت بعد ٦٢٢ه/ ١٢٢٥م).
- زبدة التواريخ، دار اقرا (بيروت: ١٩٨٦).
- الحميري، نشوان بن سعيد (ت ٥٧٣ه/ ١١٧٨م).
- الحور العين (طهران: ١٩٧٢).
- ابن حنبل، الامام احمد بن حنبل الشيباني (ت ٢٤١ه/ ٨٥٦م).
- مسند احمد بن حنبل، مؤسسة قرطبة (القاهرة: (د.ت)).
- ابن حوقل، ابو القاسم بن حوقل النصيبي (ت ٣٦٧ه/ ٩٧٧م).
- صورة الارض، دار مكتبة الحياة (بيروت: ١٩٧٩).
- ابن خرداذبة، ابو القاسم عبدالله بن عبدالله (ت ٢٨٠ه/ ٨٩٣م).
- المسالك والممالك، دار احياء التراث العربي (بيروت: ١٩٨٨).
- الخزنداري، قرطاي العزي (ت بعد ٧٠٨ه/ ١٣٠٨م).
- تأريخ مجموع النوادر، المكتبة العصرية (بيروت: ٢٠٠٥).
- الخطيب البغدادي، ابو بكر احمد بن علي (ت ٤٦٣ه/ ١٠٧٠م).
- تأريخ بغداد، دار الفكر (بيروت: د.ت).
- ابن خلكان، شمس الدين احمد بن محمد الاربلي (ت ٦٨١ه/ ١٢٨٢م).
- وفيات الاعيان، تحقيق: احسان عباس، دار صادر (بيروت: ١٩٧٧).
- خليفة بن خياط الليثي العصفري (ت ٢٤٠ه/ ٨٥٥م).
- تأريخ خليفة بن خياط، تحقيق سهيل زكار (دمشق: ١٩٦٨).
- ابن خميس الموصلي، الحسين بن نصر بن محمد (ت ٥٥٢ه/ ١١٥٧م).
- عجائب الابرارو محاسن الاخيار، دار الكتب العلمية (بيروت: ٢٠٠٦).
- الدار قطني، ابو الحسن علي بن عمر البغدادي (٣٨٥ه/ ٩٩٥م).
- سنن الدار قطني، دار المعرفة، (بيروت: ١٩٦٦م).
- ابن دحية، ابو الخطاب عمر بن ابي علي الحسن (ت ٦٣٣ه/ ١٢٣٥م).
- النبراس في تأريخ خلفاء بني العباس، مطبعة المعارف (بغداد: ١٩٤٦).
- الدينوري، ابو حنيفة احمد بن داود بن وننذ (ت ٢٨٢ه/ ٨٩٥م).
- الاخبار الطوال، دار الارقم بن ابي الارقم (بيروت: ١٩٩٥).
- الذهبي، شمس الدين محمد بن أحمد بن عثمان (٧٤٨ه/ ١٣٤٧م).
- تأريخ الاسلام، دار الكتاب العربي (بيروت: ٢٠٠٢).
- ميزان الاعتدال في نقد الرجل، دار الكتب العلمية (بيروت: ١٩٩٥).
- الرازي، ابو حاتم عبدالرحمن بن محمد بن ادريس (ت ٣٢٧ه/ ٩٣٩م).
- الجرح والتعديل، دار احياء التراث العربي (بيروت: ١٩٥٢).
- ابن رجب، عبدالرحمن بن احمد بن حسن (ت ٧٩٥ه/ ١٣٩٣م).
- ذيل طبقات الحنابلة، موقع www. Alwarraq. Com
- ابن رستة، علي بن عمر (ت ٢٩٠ه/ ٩٠٣م).
- الاعلاق النفسية، دار احياء التراث العربي (بيروت: ١٩٨٨).
- الروذراوي، الوزير ابو شجاع محمد بن الحسين (ت ٤٨٨ه/ ١٠٩٥م).
- ذيل تجارب الأمم، دار الكتب العلمية (بيروت: ٢٠٠٣م).

- الرهاوي المجهول (ت ٦٣٢ه/ ١٢٣٤م).
- تأريخ الرهاوي المجهول، عربة: البير ابونا، مطبعة شفيق (بغداد: ١٩٨٦م).
- الزهري، ابو عبدالله محمد بن ابي بكر (توفي اواسط القرن ٦ه/ ١٢م).
- كتاب الجغرافية، مكتبة الثقافة الدينية (القاهرة: د.ت).
- ابن الساعي الخازن، علي بن انجب البغدادي (ت ٦٧٤ه/ ١٢٧٥م).
- الجامع المختصر، ج٩، تحقيق مصطفى جواد (بغداد: ١٩٣٤).
- سبط ابن الجوزي، شمس الدين يوسف بن قزاوغلي (ت ٦٥٤ه/ ١٢٥٦م).
- مراة الزمان في تأريخ الاعيان، سنوات (٣٩٥ – ٤١١ه) (دمشق: ٢٠٠٥).
- الحوادث الخاصة بتأريخ السلاجقة (٤٤٨ – ٤٧٩ه) (انقرة: ١٩٦٨).
- الجزء الثامن، حوادث (٤٩٥ – ٦٥٤ه) نشرة سهيل زكار ضمن تأريخ دمشق (دمشق: ٢٠٠٧).
- ابن سعد، محمد بن سعد الواقدي (ت ٢٣٠ه/ ٨٤٥م).
- الطبقات الكبرى، دار صادر (بيروت: ١٩٥٨).
- الشابشتي، ابو الحسن علي بن محمد (ت ٣٨٨ه/ ٩٩٨م).
- الديارات، مطبعة المعارف (بغداد: ١٩٦٦).
- ابو شامة، عبدالرحمن بن اسماعيل المقدسي (ت ٦٦٥ه/ ١٢٦٧م).
- الروضتين في اخبار الدولتين، دار الكتب العلمية (بيروت: ٢٠٠٢).
- ابن شاهنشاه، محمد بن تقي الدين عمر الأيوبي (ت ٦١٧ه/ ١٢٢٠م).
- مضمار الحقائق وسر الخلائق، عالم الكتب (القاهرة: ١٩٦٨).
- ابن شداد، بهاء الدين يوسف بن رافع بن تميم (ت ٦٣٢ه/ ١٢٣٤م).
- النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية، دار الاوائل (دمشق: ٢٠٠٣).
- ابن شداد، عزالدين محمد بن علي بن ابراهيم (ت ٦٨٤ه/ ١٢٨٥م).
- الاعلاق الخطيرة، ج١ (دمشق: ١٩٩١)، ج٣ (دمشق: ١٩٧٨).
- تأريخ الملك الظاهر، باعتناء احمد حطيط (بيروت: ١٩٨٣).
- ابن الشعار، المبارك بن الشعار الموصلي (ت٦٥٤ه/ ١٢٥٦م).
- قلائد الجمان، دار الكتب العلمية (بيروت: ٢٠٠٥).
- الشهرستاني، ابو الفتح محمد بن عبدالكريم (ت ٥٤٨ه/ ١١٥٣م).
- الملل والنحل، مطبعة حجازي (القاهرة: د.ت).
- الصابئ ابو الحسين هلال بن محسن بن ابراهيم (ت ٤٤٨ه/ ١٠٥٦م).
- تأريخ هلال الصابئ، دار الكتب العلمية (بيروت: ٢٠٠٣).
- ابن صصري، محمد بن محمد (ت ٧٩٩ه/ ١٣٩٧م).
- الدرة المضيئة في الدولة الظاهرية، جامعة كليفورنيا (بيركلي د.ت).
- الصفدي، صلاح الدين خليل بن ايبك (ت ٧٦٤ه/ ١٣٦٣م)
- تحفة ذوي الالباب، دار صادر، ط٢ (بيروت: ١٩٩٩).
- الوافي بالوفيات، دار فرانس شتاينر (شتوتغارت: ١٩٨٢ – ١٩٩١).
- الصولي، ابوبكر محمد بن يحيي بن عبدالله (ت٣٣٥ه/ ٩٤٧م).
- أخبار الراضي بالله والمتقي بالله، دار المسيرة (بيروت: ١٩٧٩).
- الطبراني، ابو القاسم سليمان بن احمد (ت ٣٦٠ه/ ٩٧١م)
- المعجم الاوسط، دار الحرمين، (القاهرة: ١٤١٤ه).
- الطبري، ابو جعفر محمد بن جرير (ت ٣١٠ه/ ٩٢٣م).
- تأريخ الطبري (تأريخ الرسل والملوك)، دار المعارف (القاهرة: ١٩٧٩ – ١٩٨٢).
- تفسير الطبري، دار الفكر (بيروت: ١٤٠٥ه).
- ابن الطقطقي، محمد بن علي بن طباطبا (ت ٧٠٩ه/ ١٣٠٩م).
- الفخري في الاداب السلطانية، دار صادر: (بيروت: ١٩٦٠).
- ابن الطوير، المرتضي عبدالسلام القيسراني (ت ٦١٧ه/ ١٢٢٠م).
- نزهة المقلتين في أخبار الدولتين، دار صادر (بيروت ١٩٩٢).
- ابن العبري، ابو الفرج غريغوريوس بن هارون الملطي (ت ٦٨٦ه/ ١٢٨٧م).
- تأريخ الزمان، ترجمة الاب اسحاق أرملة، دار المشرق (بيروت: ١٩٩١).
- ابن العديم، كمال عمر بن هبة الله احمد (ت ٦٦٠ه/ ١٢٦٢م).
- بغية الطلب في تأريخ حلب، دار الفكر (بيروت: ١٩٨٨).
- زبدة الحلب من تأريخ حلب (بيروت: ١٩٥١ – ١٩٦٨).
- ابن عساكر، أبو القاسم علي بن الحسن (ت ٥٧١ه/ ١١٧٥م).
- تأريخ دمشق الكبير، دار الفكر (بيروت: ١٩٩٥).
- العظيمي، محمد بن علي الحلبي (ت ٥٥٦ه/ ١١٦١م).
- تأريخ حلب (تأريخ العظيمي) تحقيق ابراهيم زعرور (دمشق: ١٩٨٤).
- العمادالاصفهاني، ابو حامد محمد بن محمد (ت ٥٩٧ه/ ١٢٠٠م).
- البستان الجامع (منسوب إليه)، المكتبة العصرية (بيروت: ٢٠٠٢).

- زبدة النصرة ونخبة العصرة، اختصار الفتح بن علي البنداري (ليدن: ١٨٩٩).
- خريدة القصر وجريدة العصر، القسم العراقي، ج٢ (بغداد: ١٩٦٤)، قسم شعراء الشام (دمشق: ١٩٥٥- ١٩٥٩).
- العمري، شهاب الدين احمد بن يحيي بن فضل الله (ت ٧٤٩هـ/ ١٣٤٨م).
- التعريف بالمصطلح الشريف، دار الكتب العلمية (بيروت: ١٩٨٨).
- مسالك الأبصار، السفر الثالث، المجمع الثقافي (ابو ظبي: ٢٠٠٣).
- السفر الثامن، المجمع الثقافي (ابو ظبي: ٢٠٠٠).
- ابن العميد، المكين جرجيس بن العميد (ت ٦٧٢هـ/ ١٢٧٣م).
- اخبار الأيوبيين، منشورات المعهد الفرنسي (دمشق: ١٩٥٨).
- الغساني، الملك الاشرف اسماعيل بن العباس (ت ٨٠٣هـ/ ١٤٠٠م).
- العسجد المسبوك والجوهر المحكوك، دار البيان (بغداد: ١٩٧٥).
- الفارقي، احمد بن يوسف علي بن الازرق (ت بعد ٥٧٧هـ/ ١١٨١م).
- تأريخ الفارقي، (الدولة المروانية)، دار الكتاب اللبناني (بيروت: ١٩٧٤). ج٢، نشر ضمن الموسوعية الشامية، ج١١، (دمشق: ١٩٩٥).
- أبو الفداء، الملك المؤيد اسماعيل بن علي (ت ٧٣٢هـ/ ١٣٣٢م).
- تأريخ ابو الفداء، دار الكتب العلمية (بيروت: ١٩٧٧).
- ابن الفقية، ابوبكر بن محمد (ت ٣١٠هـ/ ٩٢٣م).
- مختصر كتاب البلدان، دار احياء التراث العربي (بيروت: ١٩٨٨).
- ابن الفوطي، كمال الدين عبدالرزاق بن احمد (ت ٧٢٣هـ/ ١٣٢٣م)
- مجمع الاداب في معجم الالقاب، تحقيق: محمد الكاظم (طهران: ١٤١٦م).
- القاضي وكيع، ابوبكر محمد بن خلف بن حيان (ت ٣٠٦هـ/ ٩١٨م)
- اخبار القضاة، تحقيق: عصمت الله عنايت الله (اسلام اباد: د.ت).
- قدامة بن جعفر، ابو الفرج قدامة بن جعفر بن قدامة (ت٣٣٧هـ/ ٩٤٨م).
- الخراج و صناعة الكتابة، دار الحرية للطباعة (بغداد: ١٩٨١).
- القرطبي، عريب بن سعيد (ت ٣٦٦هـ/ ٩٧٧م).
- صلة تأريخ الطبري، دار المعارف (القاهرة: ١٩٨٢).
- القزويني، زكريا بن محمد بن محمود (ت ٦٨٢هـ/ ١٢٨٣م).
- آثار البلاد واخبار العباد دار صادر (بيروت: د.ت).
- القشيري، ابو القاسم عبدالكريم بن هوزان (ت ٤٦٥هـ / ١٠٧٢م).
- الرسالة القشيرية في علم التصوف، دار التربية (بغداد: د.ت).
- القضاعي، ابو عبدالله محمد بن سلامة بن جعفر (ت ٤٥٤هـ/ ١٠٦٢م).
- تاريخ القضاعي، دار الكتب العلمية (بيروت: ٢٠٠٤).
- القلانسي، ابويعلي حمزة بن اسد التميمي (ت ٥٥٥هـ/ ١١٦٠م).
- ذيل تأريخ دمشق، نشر ضمن تأريخ دمشق (دمشق: ٢٠٠٧).
- القاضي عياض (ت ٥٤٤هـ/ ١١٤٩م).
- الغنية، فهرست شيوخ القاضي عياض، دار الغرب (بيروت: ١٩٨٢).
- الكتبي، محمد بن شاكر (ت ٧٦٤هـ/ ١٣٦٣م).
- عيون التواريخ، دار الحرية للطباعة (بغداد: ١٩٨٤).
- فوات الوفيات والذيل عليها، دار صادر (بيروت: ١٩٧٣).
- الكازروني، ظهير الدين علي بن محمد البغدادي (ت ٦٩٧هـ/ ١٢٩٨م).
- مختصر التأريخ، تحقيق: د.مصطفى جواد، مطبعة الحكومة (بغداد: ١٩٧٠).
- ابن ماكولا، علي بن هبة الله (ت ٤٧٥هـ/ ١٠٨٢م).
- الاكمال، دار الكتب العلمية (بيروت: ١٤١١هـ).
- المزي، يوسف بن الزكي عبدالرحمن (ت ٧٤٢هـ/ ١٣٤١م).
- تهذيب الكمال، مؤسسة الرسالة (بيروت: ١٩٨٠).
- ابن المستوفي، شرف الدين المبارك بن أحمد الاربلي (ت ٦٣٧هـ/ ١٢٣٩م).
- تأريخ اربل، دار الرشيد للنشر (بغداد: ١٩٨٠).
- مسعر بن المهلهل، أبى دلف الخزرجى (ت ٣٩٠هـ/ ١٠٠٠م).
- الرسالة الثانية، نشرها مينورسكي، مطبعة جامعة القاهرة (القاهرة: ١٩٥٥). المسعودي، ابو الحسن علي بن الحسين بن علي (ت ٣٤٦هـ/ ٩٥٧م).
- التبية والاشراف، مكتبة خياط (بيروت: ١٩٦٥).
- مروج الذهب ومعادن الجوهر، دار الاندلس (بيروت: ١٩٨١).
- مسكوية، ابة علي احمد بن محمد بن يعقوب (ت: ٤٢١هـ/ ١٠٣٠م).
- تجارب الأمم، دار الكتب العلمية (بيروت: ٢٠٠٣).
- المقريزي، تقي الدين أحمد بن علي (ت ٨٤٥هـ/ ١٤٤١م).
- الخطط المقريزية، دار الكتب العلمية (بيروت ١٩٩٨).
- المنذري، زكي الدين عبدالعظيم بن عبدالقوي (ت ٦٥٦هـ/ ١٢٥٨م).
- التكملة لوفيات النقلة، مؤسسة الرسالة، ط٤ (بيروت: ١٩٨٨).
- مؤلف مجهول (القرن ٣هـ/ ٩م).
- اخبار الدولة العباسية، دار الطليعة (بيروت: ١٩٧١).
- مؤلف مجهول.

- اخبار مجموعة في فتح الاندلس، مطبعة زبدنير (مجريط: ١٨٦٨). مؤلف مجهول (القرن ٧هـ / ١٣م).
- تأريخ دولة الاكراد، تحقيق د.موسى مصطفى الهسنياني (دهوك: ٢٠١٠).
- مؤلف مجهول.
- العيون والحدائق في اخبار الحقائق، ج٤، ق١، مطبعة النعمان (النجف الاشرف: ١٩٧١)، ج٤، ق٢، (دمشق: ١٩٧٣).
- مؤلف مجهول (الف كتابة حوالي عام ٤٩٨هـ/ ١١٠٤م).
- فصول من تأريخ الباب وشروان، نشرها مينورسكي (كامبريج: ١٩٥٨).
- مؤلف مجهول (القرن ٨هـ/ ١٤).
- كتاب الحوادث، دار الغرب الاسلامي (بيروت: ١٩٩٧).
- ابن الموصلايا، العلاء بن الحسن بن وهب الكاتب (ت ٤٩٧هـ/ ١١٠٣م).
- رسائل ابن الموصلايا، مركز زايد للتراث والتأريخ (العين: ٢٠٠٣).
- ميخائيل السرياني، مار ميخائيل بن القس ايليا (ت ٥٩٦هـ/ ١١٩٩م).
- تأريخ مارميخائيل السرياني، عربة صليبا شمعون، (حلب: ١٩٩٦).
- ناصر خسرو، ناصري خسرو القبادياني المروزي (ت ٤٨١هـ/ ١٠٨٨م).
- سفرنامة، رحلة ناصري خسرو، ترجمها د.يحيي الخشاب (بيروت: ١٩٧٠).
- ابن نباتة السعدي، ابو نصر عبدالعزيز بن نباتة (ت ٤٠٥هـ/ ١٠١٤م).
- ديوان ابن نباتة السعدي، وزارة الثقافة والاعلام (بغداد: ١٩٧٨).
- ابن النديم، ابو الفرج محمد بن اسحق النديم (ت ٣٨٣هـ/ ٩٩٣م).
- الفهرست، دار المعرفة (بيوت: ١٩٧٨).
- نظام الملك، ابو علي بن علي الطوسي (م ٤٨٥هـ/ ١٠٩٢م).
- سير الملوك (سياست نامة)، ترجمة: د.يوسف بكار (اربد: ٢٠٠٧).
- ابن نظيف الحموي، محمد بن علي (ت في حدود ٦٤٠هـ/ ١٢٤٢م).
- التأريخ المنصوري، تحقيق ابو العيد دودو، مطبعة الحجاز (دمشق: ١٩٨١).
- النسوي، محمد بن احمد (ت ٦٣٩هـ/ ١٢٤١م).
- سيرة جلال الدين منكبرتي، دار الفكر العربي (القاهرة: ١٩٥٣).
- النويري، شهاب الدين احمد بن عبدالوهاب (ت ٧٣٣هـ/ ١٣٣٣م).
- نهاية الارب في فنون الأدب، دار الكتب العلمية (بيروت: ٢٠٠٤).
- ابن واصل، جمال الدين محمد بن سالم (ت ٦٩٧هـ/ ١٢٩٧م).
- مفرج الكروب في اخبار بني ايوب، ج١- ٥ (القاهرة: ١٩٥٣ - ١٩٧٥)، ج٦، المكتبة العصرية (بيروت: ٢٠٠٤).
- ياقوت الحموي، ياقوت بن عبدالله الرومي (ت ٦٢٦هـ/ ١٢٢٩م)
- معجم البلدان، دار احياء التراث العربي (بيروت: د.ت).
- اليعقوبي، احمد بن اسحاق بن جعفر (ت بعد ٢٩٣هـ/ ٩٠٦م).
- تأريخ اليعقوبي، مطبعة شريعت (قم المقدسة: ١٤٢٥هـ).
- كتاب البلدان، دار احياء التراث العربي (بيروت: ١٩٨٨).
- اليونيني، قطب الدين موسى بن محمد (ت ٧٢٦هـ/ ١٣٢٦م).
- ذيل مراة الزمان، نشر ضمن تأريخ دمشق (دمشق: ٢٠٠٧).

*** به زمانی فارسی:**

- جامى، نورالدين عبدالرحمن (ت ٨٩٨هـ/ ١٤٩٣م).
- نفحات الانس، إنتشارات اطلاعات (تهران: ١٣٨٢هـ. ش).
- جويني، علاء الدين عطاملك بن بهاء الدين محمد (ت ٦٨١هـ/ ١٢٨٢م).
- تأريخ جهانگشاى، جاب مشعل ازادى (تهران: ١٣٧٨هـ.ش).
- حمد الله مستوفى، حمد الله بن ابى بكر قزويني (ت ٧٥٠هـ/ ١٣٤٩م).
- تأريخ گزيده، إنتشارات امير كبير (تهران: ١٣٨١ هـ . ش).
- نزهه القلوب، إنتشارات حديث امروز (قزوين: ١٣٨١ هـ. ش).
- الراوندى، محمد بن على سليمان (ت بعد ٦٠٣هـ/ ١٢٠٦م).
- راحه الصدور وايه السرور در تأريخ آل سلجوق (تهران: ١٣٦٣ هـ. ش).
- شيرازى، عيسى بن جنيد (ت بعد ٧٩١هـ/ ١٣٨٩م).
- تذكرة هزار مزار، ترجمة كتاب شد الازرار (شيراز: ١٣٦٤هـ.ش).
- عتبي، محمد بن عبدالجبار (ت ٤٣١هـ / ١٠٣٩م).
- تأريخ يميني، مترجم: ناصح بن ظفر جرفادقاني (تهران: ١٣٨٢ هـ.ش).
- القاشاني، ابو القاسم عبدالله بن محمد (ت ٧٣٨هـ/ ١٣٣٧م).
- تأريخ او لجايتو، به اهتمام مهين همبلي (تهران ١٣٨٤ هـ. ش).
- قاضي احمد غفاري قزويني (ت ٩٧٥هـ/ ١٥٦٧م).
- تأريخ جهان ارا، كتاب فروشي حافظ (تهران: ١٣٤٣ هـ. ش).
- قطران تبريزي، حكيم قطران بن منصور (ت بعد ٤٦٥هـ/ ١٠٧٢م).
- ديوان حكيم قطران تبريزي، إنتشارات ققنوس (تهران:

١٣٦٢هـ . ش).
- محمد عوفي، محمد بن محمد بن يحيى البخاري (ت ٦٣٠هـ/ ١٢٣٢م).
- لباب الالباب، كتاب فروشي فخر رازي (تهران: ١٣٨١ هـ.ش).
- مؤلف مجهول (قرن پنجم هجري / يازدهم ميلادي).
- تأريخ سيستان، نشر مركز (تهران: ١٣٨٢هـ. ش).
- مؤلف مجهول (تاليف سال ٥٢٠هـ/ ١١٢٦م).
- مجمل التواريخ والقصص، چاپخانه خاور (تهران: ١٣١٨هـ. ش).
- هروي، ابو اسماعيل عبدالله انصاري (ت ٤٨١هـ/ ١٠٨٨م).
- طبقات الصوفية، إنتشارات توس (تهران: ١٣٦٢ هـ.ش)
- الهمداني، رشيد الدين فضل الله (ت ٧١٨هـ/ ١٣١٨م).
- جامع التواريخ، تصيحيح بهمن كريمي، جاب اقبال (تهران: ١٣٦٢ هـ. ش).

* سەرچاوە نوێیەكان.
- ارام تيرغيفونديان، دراسات استشراقية حول العلاقات الارمنية – العربية، ترجمة: الكسندر كشيشيان، دار النهج (حلب: ٢٠٠٧).
- ارشاك بولاديان، الاكراد في حقبة الخلافة العباسية في القرنين ١٠ – ١١م ترجمة: الكسندر كشيشيان، الدار الوطنية الجديدة (بيروت: ٢٠٠٩).
- بدري محمد فهد، تأريخ العراق في العصر العباسي الاخير (بغداد: ١٩٧٣).
- حيدر لشكري، الكرد في المعرفة التأريخية، دار سبيريز (دهوك: ٢٠٠٤).
- دائرة المعارف الاسلامية، الترجمة العربية، دار الفكر (بيروت: د.ت)، مادة أتا، ج١، مادة التصوف، ج٥.
- الديوة جي، سعيد، الموصل في العهد الاتابكي (بغداد ١٩٥٨).
- زامباور، ادوارد، معجم انساب والاسرات الحاكمة (بيروت: ١٩٨٠).
- الزيباري، د.محمد صالح طيب، سلاجقة الروم في آسيا الصغرى، دار دجلة (عمان: ٢٠٠٧).
- الصياد، د.فؤاد عبدالمعطي، المغول في التأريخ (بيروت: د.ت).
- عبدالرازق منصور، دراسة النقوش العربية في المتحف الاسلامي بالقدس (عمان: ١٩٩٥).
- عبدالرقيب يوسف، الدولة الدوستكية، ج١، مطبعة الواء (بغداد: ١٩٧٢)، ج٢ القسم الحضاري، دار ئاراس (اربيل: ٢٠٠١).
- العريني، د.السيد الباز، المغول، دار النهضة العربية (بيروت: ١٩٦٧).
- علي بيومي، قيام الدولة الأيوبية في مصر، (القاهرة: ١٩٥٢).
- عمادالدين خليل، عمادالدين زنكي (الموصل: ١٩٨٥).
- فاروق عمر فوزي، الخلافة العباسية، دار الشروق (عمان: ٢٠٠٣).
- فازلييف، العرب والروم، دار الفكر العربي (القاهرة: ١٩٣٤).
- قادر محمد حسن، الامارات الكردية في العهد البويهي، مؤسسة موكرياني (اربيل٢٠١١ ).
- محسن محمد حسين، اربيل في العهد الاتابكي، مطبعة اسعد (بغداد: ١٩٧٦).
- النقشبندي، حسام الدين علي غالب، آذربيجان، دراسة في احوالها السياسية والحضارية، اطروحة دكتوراه غير منشورة، جامعة بغداد (بغداد: ١٩٨٤).
- الكرد في الدينور وشهرزور، جامعة بغداد (بغداد: ١٩٧٥).
- نيكولسون، رينولد، في التصوف الاسلامي وتأريخه (القاهرة: ١٩٦٩).
- هاملتون جب، صلاح الدين الأيوبي (بيروت: ١٩٧٣).

* ژێدرە فارسییەكان:-
- احمد كسروى، شهرياران گمنام، مؤسسة نگاه (تهران، ١٣٨٥ هـ. ش).
- مينورسكى، فلادمير فيودورفيج، پژوهشهايى درتأريخ قفقاز، ترجمة: محسن خادم (تهران، ١٣٧٥ هـ.ش).

*** شاڵاوی خوارزمییەکان بۆ سەر کوردستان:**

**توێژینەوەیەکی مێژوویی لە بارەی کۆمەڵکوژی خوارزمییەکان لە کوردستان لە سەردەمی سوڵتان (جەلالودین منکوبرتی) (٦١٧- ٦٢٨/ ١٢٢٠- ١٢٣٠ز).**

د. قادر محەمەد حەسەن

خوارزمییەکان کە لە کۆتایی سەدەی شەشەمو سەرەتای سەدەی حەوتەمی کۆچی (دوازدەیەمو سێزدەیەمی زایینی) خودان دەوڵەتێکی بەهێز بوون لە رۆژهەڵاتی ئیسلامی، سەرەتا لە نێو قەڵەمرەوی سەلجوقییەکان پەرەیان بە پێگەی خۆیان داوەو دواتر توانیان بەرەبەرە بناغەی دەسەڵاتی سیاسی خۆیان لە کۆتاییەکانی سەدەی پێنجەمی کۆچی (یازدەیەمی زایینی) بچەسپێننو هەتا ساڵی (٦٢٨ك/ ١٢٣٠ز) درێژە بە حوکمرانیان بدەن کە لەسەردەستی مەغۆلەکان کۆتایی پێهات. لە ماوەی حوکمرانی سوڵتان (جەلالەدین منکبرتی) (٦١٧- ٦٢٨- ١٢٢٠- ١٢٣٠ز) ناوچەکانی رۆژهەڵاتو باکوورو باشووری کوردستان، رووبەرووی شاڵاوی خوارزمییەکان بوونەو کۆمەڵکوژی زۆریان لە ناوچەکانی (داقوقو خەلاتو چەند ناوچەیەکی دیکە) ئەنجامداو سەرەنجام قرکردن و کاولکاریو نەهامەتی بەرچاویان لەداوی خۆیان بەجێهێشت، کە مەغۆلەکان دواتر ئەوەی خوارزمییەکان لەم بوارە پێیان نەکرابوو، کردیان.

*** شاڵاوی خوارزمییەکان بۆ سەر کوردستانو جینۆسایدی خەڵك لەسەردەمی خوارزم شا (جەلالودین مەنکبرتی):**

**أ - سەرەتای شاڵاوی خوارزمییەکان:**

سەرەتای شاڵاوی خوارزمییەکان بۆ سەر کوردستان دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی خوارزم شا (عەلائەدین تکش) کە پرۆژەی فراوانخوازی بەرەو رۆژئاواو باشووری وڵاتەکی خستە واری جێبەجێکردنەوەو لە ساڵی (٥٩٠ك/ ١١٩٥ز) ئەو دەرفەتەی بۆ هاتە پێشو توانی شاری هەمەدان[1]. داگیر بکاو کۆتایی بە فەرمانرەوایی سەلجوقییەکان لەوێ بێنێ، هەرچەندە تا ماوەیەك لەگەڵ خەلافەتدا ململانێ لەسەر ئەو شارە بەردەوام بوو[2].

هەر ئەوەش وایکردبوو کە خەلیفە ئەلناسر بۆ ماوەیەك لەرێگای یەك لەوەزیرەکانییەوە گرفتی بۆ دەسەڵاتی خوارزمییەکان لەو ناوچەیە دروستکردبوو، تا خوارزم شا جارێکی دیکە هێرشی کردەوە سەر هەمەدانو ئەمجارە خراپەکاریو وێرانکاری زۆریان کردو ماڵو دارایی خەڵكو جوتیارە کوردییەکانیان بە تالان برد[3]. ئەمەش سەرەتای جینۆسایدی خوارزمییەکانە لە کوردستان، بەڵام لەسەردەمی خوارزم شا (عەلائەدین محەمەد ٥٩٦ - ٦١٧ك/ ١١٩٩- ١٢٢٠ز) فشاری خوارزمییەکان زیاتر بوو، بەتایبەتی کە دەیانەویست دەست بەسەر بەغدادا بگرنو چەند جارێك داوایان لە خەلیفە کردبوو کە هەژموونی خوارزمییەکان بەسەر پایتەختی خەلافەتەوە با جێگرەوەی هەژموونی سەلجوقییەکان بێت کە ئەو کات دەوڵەتەکەیان پوکابۆوە، بەڵام خەلیفە بەمە رازی نەبوو، بۆیە خوارزم شا عەلائەدین بەمەبەستی گرتنی بەغدا لە ساڵی ٦١٤ك/ ١٢١٧ز شاڵاوی بەرەو رۆژئاوای قەڵەمرەوەکەی بردو جارێکی دیکە بەشێکی کوردستان لە رۆژهەڵاتەوە پێخوستی سوپای خوارزمییەکان بوو، بەتایبەتی شاری هەمەدان، کە بۆ ماوەیەك دەسەڵاتی خوارزمییەکانی تێدا نەمابوو[4].

ئەم لەشکرکێشیە ئەگەرچی گرتنی بەغدای لێنەکەوتەوە بەڵام بووە هۆی چەسپاندنی زیاتری دەسەڵاتی خوارزمییەکان لە بەشێکی زۆری هەرێمی چیاکان (اقليم الجبال).

هەر لەماوەی دەسەڵاتدارییەتی خوارزم شا (عەلائەدین محەمەد) هێرشی مەغۆلەکان بۆ سەر قەڵەمرەوی خوارزمییەکان چڕ بۆوەو کە لەسۆنگەی کوشتنی چەند بازرگانێکی مەغۆلی لەلایەن کاربەدەستێکی خوارزمی بۆ تۆڵەسەندنەوە پەرەی گرتبوو[5].

ئیدی ئەوە بوو بەسەرەتایەکی ترسناكو سەرەنجام داگیرکردنی زۆربەی رۆژهەڵاتی ئیسلامی لەلایەن مەغۆلەکانەوە لێکەوتەوە. هەر بەهۆی ئەمەوە چەندە فشاری مەغۆلەکان زیادی دەکرد، هێندە مەترسی خوارزمییەکان بۆ سەر کوردستانو ناوچەکانی دیکە لە هەڵکشاندابوو، بەشێوەیەك وای لێهاتبوو خوارزمییەکان بەدوای جێ پێی نوێو قەڵەمرەوی دیکەدا دەگەران، کە کوردستانی ئەو حەلە هەم پانتاییو هەم رێبازی گوزەر کردنی سوپایەکەیان بوو بەرەو ناوچەکانی رۆژئاوا.

**ب- شاڵاوو جینۆسایدی خوارزمییەکان بۆ سەر کوردستان لەسەردەمی خوارزم شا (جەلالودین مەنکوبرتی):-**

لەسەردەمی خوارزم شا (جەلالودین مەنکوبرتی (٦١٧ - ٦٢٨ك/ ١٢٢٠- ١٢٣٠ز) فراوانخوازی خوارزمییەکان بەشێکی دیاری ئەو هەرێمانەی گرتەوە کە ناوچەی کوردنشینەکانی تێدا بوو، چونکە نە مەرگی خوارزم شا (عەلائەدین محەمەد)و نە مەترسی بەردەوامی مەغۆلەکانی، خوارزمییەکانی ساردنەکردەوە لە درێژەدان بە هەڵپەی دەستخستنی سەرزەمینی نوێو بەکارهێنانی دژی رکابەرەکانیانو سەرەنجام پەیداکردنی دەڤەری نوێ لەسەر حیسابی هێزە ناوچەییەکان.

خوارزم شا جەلالودین دوای بوونی بە هەمەکارەی خوارزمییەکان، ماوەیەك لە هیندستان لە هەوڵی پاراستنی ناوچەکانی دابوو، دواتر لەوێوە خوزستانو عێراق هەڵکشاو پاشان بەرە بەرە ئازربیجانو هەندێك ناوچەی ئەرمینیای خستە بن دەستو بەخێرایی بەڵام بەپچڕ پچڕی دەسەڵاتداریەتی خۆی لەم ناوچانە پەرە پێدا[6].

لەنێو کۆی داگیرکارییەکانی خوارزمییەکاندا لە کوردستان سەرچاوە مێژووییەکان زیاتر زانیارییان لەسەر جینۆساید لە هەردوو ناوچەی داقوقو خەلات یاداشت کردووە بۆیەش بەتایبەتی لەم توێژینەوەیەدا لەسەر شاڵاو کۆمەڵکوژییەکان لە داقوق باسدەکەین.

*** داقوق:**

(داقوق) یان (دقوقا) شارۆچکەیەکی بە گوندو ئاوەدانیەو دەکەوێتە نێوان بەغداو هەولێرو قەڵایەکی تێدایە[٧].

دیارە لە سەروبەندی فراوانخوازییەکانی (جەلالودین مەنکوبرتی)دا ئەو ناوچانە سەربەخەلافەتی عەباسی بوون، لەساڵی (٦٢٢ك/ ١٢٢٥ز) کە خوارزم شا لە هیندستانەوە بەرەو خوزستانو خواروی عێراق هات، بەڵام نەیویست پەلاماری بەغدا بدات، بۆیە گەمارۆی شارۆچکەی داقوقی دا و نیازی داگیرکردنی هەبوو، بەڵام خەڵکی داقوق رێگریان لە بەرەو پێشچوونی سوپای خوارزم شا کردو نەیانهێشت بچنە ناو شارەکە بە ووتنەوەی (الله اکبر) بەرگرییەکی زۆریان کردوو، بە سەرزەنشتو جنێو دژایەتی سەرسەختانەی خۆیان بۆ خوارزم شا دەربری، کە بەمە تووڕەو شێتگیر بوو، ئەمە زیاتر سوریکرد لەسەر هێرشکردنو تاتوانی بیگرێت، کە وەکو تۆڵە سەندنەوە دەستی جەنگاوەرانی خۆی والأکرد بۆ تاڵانو وێرانکاریو کوشتنو برین، خەڵکێکی زۆریان قەتلوعام کرد ئەوانەی رزگاریان بوو ئاوارەو دەربەدەری وڵاتان بوون[٨].

ئەلنسوی کە نووسەری کتێبی (ژیاننامەی جەلالودین مەنکوبرتی)یەو لەزۆربەی شەڕەکانی لەگەڵی بووە، یاداشتی کردووە کە سوڵتان جەلالودین وەختێك ویستوویەتی لە دەورووبەری بەغداوە بەرەو ئازەربیجان بەرێبکەوێت کە لە دقوقا نزیك بۆتەوە خەڵکەکەی چوونەتە سەر شورەی شارۆچکەکەو جنێویان بە سوڵتان داوە بۆیە فەرمانی کردووە بەبەسەرداداني دقوقاو گرتویانەو شمشێریان لە خەڵك نەپاراستووەو زۆریان لێکوشتوون، وەلەم بارەیەو نووسیوویە: ((فلما أشرف على دقوقا صعد أهلها السور فصرحوا بالشتائم، لما بلغهم من شنة (أي السلطان) الغارات على بلاد الديوان، فأغاظه ما أسمعوة، فأمر بالزحف عليها، فلم يكن الا حملة واحدة حتى صعدت الاعلام، وترادف الزحام، ووضعوا في أهلها السيوف، فألي أن نودي بالكف هلك خلق كثير، وصمد السلطان نحو أذربيجان..))[٩].

ئەوەی لە گێڕانەوەکەی مێژوونووس (ابن الاثیر) دەردەکەوێ ئەوەیە کە سوڵتانی خوارزمی بەنیازی داگیرکردنی داقوق بووەو هەر بۆیەش بەوێدا گوزەری کردووە، بەڵام لەگێڕانەوەکەی ئەلنسوی تێبینی ئەوە دەکرێ کە سوڵتان تەنها وەکو رێبازێك ئەوێی بەکارهێناوە، بەڵام کە خەڵکی دقوقا زانیویانە سوڵتان دەستدرێژی کردۆتە سەر قەڵەمرەوی، خەلافەت، چونەتە سەر شورەکەو جنێویان پێداو ئەوجا ئەویش بریاری هێرش بردنەسەری داوە، لەنێو ئەو دوو گێڕانەوەیەدا ئەوەی (ابن الاثیر) زیاتر لەراستییەوە نزیکە چونکە:

- سوپای خوارزمی لە ناوچەکانی دیکە پێش بگاتە داقوق داگیرکاریو تاڵانی کردووە ویستویەتی هەمان کار لەگەڵ (داقوق) یش بکات.
- ئەگەر نیازی خوارزمییەکان بۆ خەڵکی داقوق دیار نەبا ئەوا ئەوان پێش گەیشتنی سوپای خوارزمی ئامادەباشیان بۆ بەرگری نەدەکردوو، شورەی شاریان قایم نەدەکرد.
- پێویستە ئەوە لەبەرچاوەبگرین کە ئەلنسوی وەکو مێژوونووسو هەمەکارەیەکی دەرباری خوارزمییەکان بووە، بۆیە بیانوو بۆ هێرشکردنەسەر شارۆچکەکە بەوە دێنێتەوە کە خەڵکەکەی بە جنێودان سوڵتانیان تووڕەکردووە، تا پاکانەی ئەو جینۆسایدە بکات کە لەوێ کراوە.

مێژوونوسەکان کۆکن کە خوارزمییەکا دوای گرتنی داقوق دەستیان نەپاراستووە خەڵکێکی زۆریان کوشتووە وێرانکاری وتێکدانیان لەدوای خۆیان بەجێهێشتووە[١٠]. هەتا مێژوونووسی واهەیە نووسیوویە کە منکبرتی هەموو خەڵکی داقوقی کوشتووە[١١]، هەروەها تاڵانی وپەلکێشکردنی خەڵكو سوتاندنی شارۆچکەکەو ئەنجام دانی رەفتاری وا لەوێ کە بەقسەی مێژوونووس (الذهبي) خەسڵەتی کافران بوون[١٢].

هەر لەم بارەیەوە مێژوونووس (ابن الاثیر) ئاماژەی بەوە کردووە کە بۆ خۆی یەك لە پیاو ماقوڵانی (بنو یعلی) کە خەڵکی داقوق بوون بینیووە کە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند بوون، لەکارەساتی خوارزمییەکاندا تاڵان کراونو لەو قەتلوعامەدا یەکێکیان لەگەڵ دووکوری رزگاریان بووە کە ئاوارەی موسڵ و شام بوونو نەهامەتیو چەرمەسەری زۆریان چێشتووە[١٣].

لەسۆنگەی ئەو زانیارییانەی کە لەسەرچاوە مێژووییەکان سەبارەت بە جینۆسایدی خوارزمییەکان لە شارۆچکەی داقوق تۆمارکراوە دەگەینە چەند بەرەنجامێك:

- سوپای خوارزمی پاش چەندان شەری یەك لەدوای یەك لە خوزستانو باشووری عێراق، یەکەمجاربوو تووشی بەرەنگارییەکی سەخت بۆوە کە بۆ ئەوان چاوەڕواننەکراو بوو.
- پێدەچێت ئەو نەفرینو جنێوانەی کە خەڵکی شارۆچکەکە بە خوارزم شا جەلالودین یان ووتوە ئەوی پەیگیر تر کردووە لەسەر گرتنی شارەکەو سزادانی خەڵکەکەی بە کوشتاری بە کۆمەڵ.
- ئەو زانیارییانەی باس لە قرکردنی تەواوی ئاکنجیانی داقوق دەکەن زیادەرەویان تێدایە، چونکە خەڵکی لێ رزگار بووەو ئاوارە بوون وەکو ئاماژەمان پێکرد، وادیارە ناوچەکانی موسڵو شام وەکو پەناگەیەك بووە بۆیان.
- نازانرێ داگیرکردنی شارۆچکەکە چەندی پێچووە، کە پێدەچێت بەهۆی بەرگری خەڵکەکەی تارادەیەك ماوەیەکی خایاندبێت بەڵام بەلەبەر چاوگرتنی ناهاوسەنگی هێزو نەبوونی هێزێکی کارای بەرگریکاری رێکخراو سەرەنجام بەهێز بەردەستکراوە، ئەوەش روون نیە کە ماوەی داگیرکارییەکە چەندی خایاندووە، بەڵام وادیارە کەمخایەن بووە چونکە سوپای خوارزمییان راستەوخۆ دوای گرتنی شارۆچکەکە بەرەو ئازەربیجان چووە.

* پەراوێزەکان:-

١- هەمەدان: شارێکی گەورەو ناوچەیەکی هەراوە لە هەرێمی چیاکان، پێشی وتراوە (ما ه البصرة) بڕوانە: اليعقوبي، كتاب البلدان، دار احياء التراث العربي، (بيوت: ١٩٨٨) ص ٤١.

٢- ابن الاثير، الكامل ج١٠ ص ١٢٧- ١٢٨. الراوندي، راحة الصدور واية السرور در تأريخ ال سلجوق، تصحيح: محەمەد ئيقبال، كتابفروشي علي اكبر علمي، (تهران: ١٣٦٣ هـ. ش) ص ٣٧٥.

٣- بڕوانە الراوندی، همان منبع، ص ٣٨٢- ٣٨٣).

٤- بڕوانە: ابو شامه، نزهه المقلتين، ص ٩-١١، ابن كثير، البداية والنهاية، تحقيق: ابو الفضل المياطي أحمد بن علي وعبدالرحمن فهمي الزواوي، دار الغد الجديد، (القاهرة: ٢٠٠٧) ج١٢ ص١٧٢.

٥- بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: ابن الاثير، الكامل، ج ١٠ ص ٣٣٣- ٣٤١، حمدالله المستوفي القزويني، تأريخ گزيده ص ٥٨١- ٥٨٣، محەمەد فتحی امين، الغزو المغولی لديار الاسلام، الاوائل للنشر والتوزيع، (دمشق ٢٠٠٥) ص ٥٩- ٧٨).

٦- بڕوانە: النسوي سيرة السلطان جلال الدين، ص ٢٠٧- ٢٠٩، ٢٩٩، ٢١٧، ٣٢٢، ابو شامة نزهة المقلتين، ص ٥٢، ٥٦- ٧١. جێی ئاماژەیە خوارزم شا جەلالودین داوای مافی جێگرتنەوەی دەسەڵاتداریەتی سەلجوقییەکانی دەکرد بەسەر ناوچەکای تفلیس و شیروان و دەربەند لە ناوچەکانی ئاران و ئەمینیە. بڕوانە.

V. Minorsky AHistory of Sȟarvan And Darband W. Heffer& Sons LTD .Cambridge ١٩٥٨ p ١٣٦

٧- ياقوت الحموي، المشترك وضعا والمفترق صقعا، عالم الكتب، الطبعة الثانية، (بيروت: ١٩٨٦) ص ١٨١.

٨- ابن اثير، الكامل، ج ١٠، ص ٣٨٩. بەراوردی بکە بە: ابو شامة، تراجم رجال القرنين السادس والسابع المعروف (بالذيل علي الروضتين) عنى بنشرة: عزت العطار الحسيني، دار الجيل الطبعة الثانية (بيروت: ١٩٧٤) ص١٤٤.

٩- سيرة السلطان جلال الدين منكبرتي، ص ١٩٣.

١٠- بڕوانە: ابن العبري، تأريخ الزمان، ص ٢٧٥، ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٢ ص ١٩٦. حاجي خليفة تقويم التواريخ، (از مترجم ناشناختة تصحيح: مير هاشم محدث، مركز پژوهش ميراث مكتوب، چاپ دووەم (تهران ١٣٨٤) ص ١٥٥.

١١- الحموي، التأريخ المنصوري، تلخيص الكشف والبيان في الحوادث الزمان، نشر: بطرس غريازنويچ، دار النشر للاداب الشرقية (موسكو: ١٩٦٠) ص ٣٠٦.

١٢- تأريخ الاسلام، مج ١٣، ص ٢٥٦.

١٣- الكامل، ج١٠ ص ٣٨٩- ٣٩٠.

### * پوختەیەك لە مێژووی کەرکوك بەر لە سەدەی نۆزدەهەم:

**د. بەختیار سەعید مەحموود**

کەرکوك شارێکی دێرین و کۆنەو لە نووسراوە بزمارییەکاندا باسکراوە، بەڵام بە شێوەی (ئەراپخا) ناوی هاتووە نەك بەم ناوەی ئێستای هەروەکو زۆربەی نووسەرو مێژوونووسان دووپاتی دەکەنەوە[1]. لە سەردەمی گوتییەکاندا شاری کەرکوك بنکەیەکی سەرەکی دەوڵەتی گوتی بووە. لە سەردەمی میدییەکانیشدا لە ساڵی(٦١٥) پێش زاینی پاشای میدی (کیاخسار) شاری کەرکوکی داگیر کردووە. بەڵام لە سەردەمی دەوڵەتی ساسانیدا (٢٢٦-٦٣٧) ی زایینیی شاری کەرکوك بووەتە بەشێك لە ناوچەکانی دەوڵەتی ساسانی[2]، ناوەکەشی لەم سەردەمەدا گۆڕاوە بۆ (گەرمەکان)، ئەمەش هەر بە مانای وڵاتی گەرمیان دێ[3]. پاش هاتنی لەشکری ئیسلام بۆ ناوچەکە شاری کەرکوك لە ساڵی (١٦) کۆچی - (٦٣٨)ی زایینیدا بووەتە بەشێك لە دەوڵەتی ئیسلام. لە سەردەمی ئیسلامیدا بە شێوەی (باجرمێ) ناوی هاتووە[4]، کە ئەمەش هەرمانای (گەرمەکان) ی سەردەمی ساسانییە. هەروەها یاقوتی حەمەوی لە (٦٢٦) کۆچی - (١٢٢٩)ی زایینی مردووە، بە (کرخینی) ناوی بردووە[5]. بەڵام دیارە یەکەم ناوهێنانی (کەرکوك) بەشێوەی ئەمڕۆی لەلایەن مێژوونووسی فارس (شەرەفەدین عەلی یەزدی) بووە. کە لە ڕووداوەکانی ساڵی (٧٩٦) کۆچی - (١٣٩٣)ی زایینی ناوی هێناوە[6].

لە سەرەتاکانی سەدەی شازدەهەمدا دوای ئەوەی (شا ئیسماعیلی سەفەوی) (١٥٠١-١٥٢٤)ی زایینی دەستی بەسەر بەشێکی گرنگی کوردستاندا گرت، دواتریش سوڵتان (سەلیمی یەکەم)ی عوسمانی (١٥١٢-١٥٢٠)ی زایینی لە شەڕی (چاڵدیران)ی (١٥١٤)ی زایینیدا توانی بەسەریدا زاڵ بێت، میرو سەردارانی کورد کەوتنە تێکۆشان بۆ بەدەست هێنانەوەی ناوچەکانی دەسەڵاتیان[7]. لەم چوارچێوەیەدا میری سۆران (سەیدا بەگی کوڕی شا عەلی) توانی هەردوو شاری هەولێرو کەرکوك بخاتەوە ژێر رکێفی خۆیەوە[8]، لەبەر ئەوەی میرنشینی سۆران یەکێك بووە لەو میرنشینانەی کە لەو ماوەیەدا پەیوەندی بە دەوڵەتی عوسمانییەوە کردووەو چۆتە ژێر باڵی ئەم دەوڵەتە[9]، شاری کەرکوکیش لەم ماوەیەدا واتە ساڵی (١٥١٤)ی زایینیدا بووە بە بەشێك لە دەوڵەتی عوسمانی. شایەنی باسە میرنشینی سۆران بە یەکێك لە سەنجەقە کوردییەکانی ئەیالەتی[10] دیاربەکر دەژمێردرا[11]. بەم پێیە شاری کەرکوك لەم ماوەیەدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە ڕووی کارگێڕییەوە سەر بە ئەیالەتی دیاربەکری عوسمانی بووە.

بەڵام (لۆنگریك) باس لەوە دەکات کە (شا تەهماسبی سەفەوی) (١٥٢٤-١٥٧٦)ی زایینی لە ساڵی (١٥٣٠) ی زایینیدا فەرمانڕەوایەکی خۆی لەسەر شاری کەرکوك داناوە[12]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە شارەکە جارێکی تر لەلایەن سەفەوییەکانەوە دەستی بەسەر داگیراوەتەوە. بەڵام لە سەردەمی سوڵتان (سلێمانی قانونی)دا (١٥٢٠-١٥٦٦)ی زایینی، لە چوارچێوەی ئەو شاڵاوە گەورەیەی کە کردویەتییە سەر دەوڵەتی سەفەوی، کاتێ سوڵتان لە کرماشانەوە لە ڕێگەی چیای زاگرۆسەوە ڕووەو بەغدا کشا لە ناوچەی شارەزوور نزیك بووەوە کە ئەو کات ئەم دەڤەرە سەر بە میرنشینی ئەردەڵان بوو، هەر بۆیە ئەم ناوچەیەش بووە یەکێك لە زەوییەکانی دەوڵەتی عوسمانی پاش ئەوەی میری ئەردەڵان (بیگە بەگی کوڕی مەئمون بەگ) لایەنگری خۆی بۆ دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند، بەم شێوەیە سوڵتان توانی دەسەڵاتی عوسمانییەکان بسەپێنێت بەسەر کەرکوك و ناوچەکانی دەوروبەری ئەمەش پێش داگیرکردنی بەغدا لە (٣١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٥٣٤)ی زایینیدا[13]. بەم شێوەیە ڕوون دەبێتە کە سوڵتانی عوسمانی لە ساڵی (١٥٣٤)ی زایینیدا توانی دەسەڵاتی عوسمانی بۆ کەرکوك بگەڕێنێتەوە.

شاری کەرکوك لە ماوەی دەسەڵاتی عوسمانیدا چەندین ڕووداوی گرنگی بەخۆیەوە بینی، کە لە پاشاندا کاریگەرییان بەسەر شارەکەو ناوچەکەدا بەجێ هێشت، لە گرنگترین ئەو ڕووداوانە هێرشکارییەکانی (شا عەباسی یەکەمی سەفەوی) (١٥٨٧-١٦٢٩)ی زایینی بوو بۆ ناوچەکانی کوردستانی باشوور دوای داگیرکردنی بەغدا لە ساڵی (١٦٢٣)ی زایینیدا[14].

لە چوارچێوەی ئەم شاڵاوەدا یەکێ لە میرە بەهێزەکانی میرنشینی ئەردەڵان، کە خان ئەحمەد خان بوو ڕۆڵی کاریگەری بینی لە یارمەتی دانی هێزی سەفەوییەکان و توانی دەست بگرێت بەسەر کەرکوك و[15] شارەزوورو هەندێ قەڵای ئەو دەوروبەرە[16]. دوای ئەوەی حاکمی کەرکوك نەیتوانی بەرگری بکات و شارەکەی بەدەستەوەدا[17]. بەڵام لە ساڵی (١٦٢٥)ی زایینیدا والی دیار بەکر (حافز ئەحمەد پاشا) بە هێزێکەوە توانی بچێتە ناو کەرکوك و هێزە ئێرانییەکانی لێ دەربکات، بەم شێوەیە جارێکی تر شارەکە کەوتەوە دەستی عوسمانییەکان[18].

لە کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمدا کەرکوك جارێکی تر دەبێتە گۆڕەپانی ڕووداوەکان لە ئەنجامی ئەوەی کە دەکەوێتە بەر هەڕەشەی میرنشینی بابان، بەهۆی یەکێ لە میرە هەرە بە هێزەکانی ئەم میرنشینە کە (سلێمان بەبە)[19] ی بابان بوو. ئەم میرە لە چارەکی کۆتایی سەدەی حەڤدەدا بوو بە فەرمانڕەوای میرنشینەکە. توانی ژمارەیەکی زۆر لە خێڵە کوردییەکانی ناوچەکە لە دەوری خۆی کۆبکاتەوەو سوپایەکی گەورەیان لێ دروست بکات، ئەمە جگە لەوەی سەری بۆ هیچ فەرمانڕەوایەکی ناوچەکە دانەنەواند[20] هاتنی ئەم میرە بووە هەڕەشە لەسەر شاری کەرکوك، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەم میرە دەیویست شاری کەرکوکیش بخاتە ژێر قەڵەمڕەوی خۆیەوە، دوای ئەوەی لە کۆتایی ساڵی (١٦٨٩) ی زایینی دەستی بەسەر ناوچەی شارەزوو داگرت، بەڵام (دلاوەر پاشا)ی والی شارەزوور کە مەڵبەندەکەی کەرکوك

بوو ویستی بەرگری بکاتو لە ئەنجامدا لە ساڵی دواییدا کوژرا، بەم شێوەیە کەرکوك کەوتە ناو بازنەی دەسەڵاتی میری بابان[٢١]. لە بەرانبەر ئەم پێشهاتانەدا (حەسەن پاشا)ی والی بەغدا (١٦٩٠-١٦٩١) بە سیفەتی موتەسەلیمی[٢٢] کەرکوك دانرا، بۆ گەڕانەوەی ئارامی بۆ ناوچەکە[٢٣]، بەڵام دواتر لە ئەنجامی هاریکاری نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی، ڕاپەڕینی (سلێمان بەبە) لە ساڵەکانی کۆتایی سەدەی حەڤدەدا لەنێوبرا[٢٤].

یەکێك لەو مەسەلە گرنگانەی کە تێبینی دەکرێت لەم ڕووداوە ئەوەیە کە دوای کوژرانی (دلاوەر پاشا) ئەیالەتی شارەزوور لە ڕووی کارگێڕییەوە بووە پاشکۆی ئەیالەتی بەغدا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەم ئەیالەتە بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی والی بەغداوە، کاتێ والی ناوبراو لە پاڵ پۆستەکەی خۆی ڕاسپێردرا بۆ بەڕێوەبردنی ئەیالەتی شارەزوور بە ناوی موتەسەلیم. لە کاتێکدا پێشتر ئەیالەتی شارەزوور کە مەڵبەندەکەی کەرکوك بوو هیچ جۆرە پاشکۆیەتییەکی کارگێڕی نەبوو بۆ ئەیالەتی بەغدا[٢٥]. (حەسەن پاشا)ش (١٧٠٤-١٧٢٣)ی زایینی یەکەم والی بەغدا بوو کە ئەم دەسەڵاتەی بەم شێوەیە پیادەکرد. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بە فەرمانی والییەکانی بەغدا هێزەکانی کەرکوك بەشداری لە شاڵاوەکانی والی بەغدا بکەن بۆ سەر ناوچە جیاجیاکان، ئەمەش بووە هۆی کەم بوونەوەی سەربەخۆی ئەیالەتی شارەزوور، ئەوەتا لە کاتی هێرشکارییەکانی والی بەغدا (حەسەن پاشا) بۆ سەر کرماشان، هێزی کەرکوك یەکێك بوو لە هێزە یارمەتیدەرەکانی والی بەغدا لەم شاڵاوەدا لە ساڵی (١٧٢٣)ی زایینیدا[٢٦]. لە دوایی ئەمیش (ئەحمەد پاشای کوڕی حەسەن پاشا) (١٧٢٣-١٧٤٧)ی زایینی لەسەر هەمان سیاسەتی باوکی بەردەوام بوو، ئەوەتا (لۆنگریك) کاتێ وەسفی سیاسەتی ناوبراو دەکات بەرانبەر کەرکوك دەڵێت: "سەربەخۆیەکی کەمی بۆ کەرکوك هێشتبۆوە"[٢٧]، کە ئەمەش دیسانەوە مانای پاشکۆیەتی ئەیالەتی شارەزوور بۆ ئەیالەتی بەغدا دەگەیەنێت.

یەکێکی تر لەو ڕووداوە گرنگانەی کە بەسەر شاری کەرکوکدا هاتووە بەر لە سەدەی نۆزدە، بریتییە لە شاڵاوی (نادر خانی ئەفشار)[٢٨] بۆ سەر شارەکە. نادر شا دوای ئەوەی بە لەشکرێکی گەورەوە ڕووی کردە ناوچەکە گەیشتە قەڵای کەرکوك لە ساڵی (١٧٣٣)ی زایینیدا، بەڵام نەیتوانی دەست بەسەر شاری کەرکوکدا بگرێت، هەر چەندە (نادر خان) دووجار هەوڵی گرتنی شارەکەیدا سەرکەوتوو نەبوو، بێجگە لەوەی کە ژمارەیەك خەڵکی کوشتو دەورووبەری شارەکەی وێرانکرد[٢٩]. پاش ئەمە عوسمانییەکان هێزێکیان بە سەرکردایەتی (تۆپاڵ عوسمان پاشا) نارد بۆ لێدانی (نادر شا)و یارمەتی دانی والی بەغدا، پاش ئەوەی هەردوولا لە نزیك کەرکوك ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە لە ئەنجامدا هێزی (نادر شا) شکاو پاشەکشێی کرد بۆ ئێران، بەڵام دوای سێ مانگ توانی سەرلەنوێ لەشکرەکەی ڕێکبخاتەوەو لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٧٣٣)ی زایینی لە دەشتی لەیلان لە نزیك کەرکوك توانی (تۆباڵ عوسمان پاشا) بکوژرێو لەشکرەکەی تەفروتونا بکات، بەڵام دوای ڕێکەوتن لەگەڵ والی بەغدا هەر لەم ساڵەدا نادر شا گەڕایەوە ئێران[٣٠].

بەم پێیە دەبینین لە ئەنجامی ئەم شاڵاوەدا چەند شەڕێکی گرنگ لەنێوان سوپای عوسمانیو هێزی (نادر شا) لە نزیك کەرکوك ڕوویانداوە، بێگومان بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەو ناوچەیە زیانی ماددیو کاولکاری زۆری لێبکەوێ، هەروەها شتێکی ئاساییە کەلە ئاکامدا خەڵکی ناوچەکە زەرەرمەند بووبن.

لە ساڵی (١٧٤٣)ی زایینیدا، پاش ئەوەی (نادر شا) جارێکی تر هاتەوە سەر دەوڵەتی عوسمانیو دەستی بە هێرشکارییەکانی خۆی کردەوە، لە ئەنجامدا ناوچەکە بۆ جارێکی تر کەوتەوە بەر شاڵاوی تاڵانو تێکدانو خراپەکارییەکانی شای ناوبراو، لەم چوارچێوەیەدا جاری دووەم شاری کەرکووك کەوتەوە بەر گەمارۆدان، هەرچەندە بەرگریکاران بە توندی بەرگریان کرد، بەڵام پاش هەفتەیەك لە گەمارۆدان، ژمارەیەکی زۆر لە بەرگریکاران کوژرانو پاش دەست بەسەرداگرتنی شارەکە تاڵانو برۆیەکی زۆر لە ناو شارەکەو دەورووبەریدا ئەنجام دران[٣١].

لە باسی ڕووداوەکانی ساڵی ناوبراودا مێژوونووسی ناسراو (ڕەسوڵ کەرکوکلی) باسی ئەوە دەکات کە لە ئەنجامی ئەم داگیرکردنەی شاری کەرکوك خراپترین چارەنووس بەسەر خەڵکەکەی داهات، ئەمەش لەبەر ئەوەی ماڵیان تاڵان کراوو ئافرەتەکانیان ئەتك کرانو پیاوو زاناکانیان بەدیل گیرانو باجو غەرامەی زۆریان بەسەردا سەپێنرا، تەنانەت ئەو بارودۆخەی بەسەر ئەوان داهات بووە هاندەرێك بۆ خەڵکی بەغدا تاوەکو بە توندی دژی (نادر شا) بوەستنو بەرگری بکەنو شارەکەیان بەدەستەوە نەدەن[٣٢]. شایەنی ئاماژە پێکردنە گەڕیدە (ئیڤن) کە لە ساڵی (١٧٥٨)ی زایینیدا، واتە کە ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەم ڕووداوە تێنەپەڕیبوو هاتووەتە ناوچەکە، باسی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە "لە ئەنجامی ئەم گەمارۆدانەدا (٥٠٠) کەس لە بەرگری کاران کوژرانو خەڵکەکەش تۆقینو زۆر خراپ تەنگاوکران"[٣٣].

ئەوەی لێرەدا جێگەی تێڕامانە ئەوەیە کە زۆربەی ئەو هێزانەی ویستویانە شاری بەغداو موسڵ داگیر بکەن بە تایبەتی ئێرانییەکان بە شاری کەرکوکدا تێپەڕیوون[٣٤]، ئەمەش بووەتە مایەی ماڵ وێرانیو زەرەرو زیانی گەورە بۆ خەڵکی ئەم شارە، وا دیارە داگیرکردنی شاری کەرکوك لەلایەن (نادر شا)وە لە چوارچێوەی هەوڵەکانی ناوبراو دەهات بۆ داگیرکردنی بەغدا، بێگومان شوێنو هەڵکەوتەی کەرکوکیش لەم بوارەدا ڕۆڵی خۆی هەبووە.

دوای ئەم ڕووداوانە هاتنی مەمالیکەکان[٣٥] بۆ سەر دەسەڵات لە بەغدا لە ساڵی (١٧٤٩)ی زایینیدا کاریگەری خۆی بەسەر کەرکوکدا بەجێدەهێڵێت، دیارە والییەکانی مەمالیك ئەو دەسەڵاتەیان هەبووە، کە فەرمانڕەوا بە ناوی موتەسەلیم بەسەر کەرکوکدا دابنێن بۆ بەڕێوەبردنی[٣٦]. سەرەتای دەست پێکردنی ئەم کارە بە پێی بۆچوونی یەکێك لە مێژوونووسان بۆ ساڵی (١١٩٠)ی کۆچی/١٧٧٦-١٧٧٧)ی زایینی دەگەڕێتەوە[٣٧]، هەر بۆیە مێژوونووسی ناوبراو

جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە دوای ساڵی ئاماژەپێکرا لە نوسراوە رەسمییەکاندا ناوی ئەیالەتی شارەزوور نەدەهات ئەمەش بە هۆی ئەو بارودۆخە کارگێڕییەی کە کەرکوکی تێکەوتبوو[٣٨]. بەڵام لە راستیدا ناوی شارەزوور لە رێکەوتننامەیەکدا هاتووە بە ناوی (زشتۆی) کە لە ساڵی (١٧٩١)ی زایینیدا لەنێوان دەوڵەتی عوسمانیو ئەمسادا مۆرکرا، لە راستیدا ئەو گۆرانکارییە کارگێڕییانە لە یەکەی کارگێڕی ئەیالەتی شارەزووردا نەبوو ئەوەندەی کاریگەری لە بواری کێشو دەسەڵاتی ئەیالەتەکەدا هەبوو. بەڵکو ئەیالەتەکە هەڵنەوەشایەوە بەڵام تەنها ئەرکە کارگێڕییەکەی خرایە ئەستۆی ئەیالەتی بەغدا، بۆ وێنە (سلێمان پاشای گەورە) (١٧٨٠-١٨٠٢)ی زایینی والی ئەیالەتی بەغداو شارەزوور بوو[٣٩]. ئەوەتا (لۆنگریك) ئاماژە بەوە دەکات کە کەرکوك لە پلەی ئەیالەت نەهاتووەتە خوارەوە[٤٠].

لە لایەکی ترەوە بە پێی فەرمانێکی (الباب العالی – دەروازەی باڵا) لە ساڵی (١٧٧٥)ی زایینیدا هەردوو ئەیالەتی موسڵو کەرکوك بە یەکەوە لکێنراو (حەسەن پاشا) بۆ بەڕێوەبردنیان دانرا، بۆیە کاتێك ناوبراو بووە فەرمانڕەوا بینی بارودۆخی شارەزوور دارماوە بە جۆرێك ئێرانییەکان هەرەشەیان لە کەرکوك دەکرد[٤١]. دیارە (حەسەن پاشا) لە بنەرەتەوە بۆ بەرگرتنو دژایەتی کردنی هێرشکاری ئێرانییەکان دانرا[٤٢]. لەبەر ئەوەی لەم سەردەمەدا دیسانەوە ناوچەکە رووبەرووی مەترسی ئێرانییەکان بووەوە، ئەمەش کاتێك روویدا کە حاکمی ئێران (کەریم خانی زەند)[٤٣] بەشێك لە سوپاکەی نارده کوردستان، لەبەر نەبوونی بەرگرییەکی ئەوتۆ لە ناوچەکە ئەم سوپایە توانی خۆی بگەیەنێتە دەوروبەری کەرکوك، توانی گوندو ناوچەکانی (پیرحەیاتی) و (جەباری)و (قەرەحەسەن) تالان بکات. بەڵام لەدواییدا ئەم هێزە کشایەوە[٤٤].

هەر بۆیە هاتنی مەمالیکەکان کاریگەری تەواوی هەبوو لەسەر کەم بوونەوەی دەسەڵاتی ئەیالەتی شارەزوور (کەرکوك)، بە تایبەتی لە سەردەمی (سلێمان پاشای گەورە)، (١٧٨٠-١٨٠٢)ی زایینی، لەم سەردەمەدا دەسەڵاتی مەمالیکەکانی بەغدا هەموو کوردستانی باشووری گرتەوە[٤٥]. لە ئەنجامدا بووە هۆی ئەوەی کە هێزەکانی کەرکوك بەشداری لە شەری مەمالیکەکان بکەنو ببنە هێزی پاڵپشت بۆ مەمالیکەکان، ئەمەش مانای پاشکۆیەتی ئەو ئەیالەتەی دەگەیاند. ئەوەتا کاتێك لە ساڵی (١٧٨٢)ی زایینی (مەحمود پاشای بابان) هێرش دەکاتە سەر شاری کۆیەو داگیری دەکات، (سلێمان پاشا)ی گەورە لەم کارە تووڕە دەبێتو بریاری هێرش کردنە سەری دەدات، هەر بۆیە هێزەکانی لە شاری کەرکوك مۆڵ دەدات[٤٦]، جێگەی ئاماژە پێدانە کە لەم هێرشکارییەدا موتەسەلیمی کەرکوك یارمەتی هێزەکانی والی بەغدای داوە بۆ سەر میری بابان.

لە کۆتاییدا دەبێ ئاماژە بەوە بدەین کە شوێنی جوگرافیای کەرکوك کاریگەری لەسەر شارەکە هەبوو لە رووی رووداوە سیاسییەکانەوە. هەروەها ئەو رووداوە سیاسیو کارگێڕیانەش کە لە سەدەی نۆزدەدا بەسەر شارەکەدا هاتن کاریگەریو رەنگرێژی هەبوو سەبارەت بە داهاتووی شاری کەرکوك.

*** رەوشی رامیاری کەرکوك لە سەدەی نۆزدەدا:**

*** سیاسەتی دەسەڵاتداریتی عوسمانی لە کەرکوك:**

پێش ئەوەی بێینە سەر بارودۆخی رامیاری کەرکوك واپێویست دەکات بەرچاو روونییەك بدەین لەسەر لایەنی کارگێڕی ئەم شارەو ئەو گۆرانکارییانەی لەم بوارەدا لە کەرکوكو ناوچەکانی دەوروبەری روویانداوە، لەبەر ئەوەی لایەنی ناوبراو کاریگەری لەسەر رەوشی سیاسی ناوچەکە دروست کردووە، بە جۆرێك هەندێ جار هەردوو بارودۆخی سیاسیو کارگێڕی بە شێوەی تێکهەڵکێش بەدەردەکەون، بێجگە لەوەش باسکردنی لایەنی کارگێڕی پێویستە بۆ دەستنیشانکردنی سنووری ناوچەکانی سەر بە شاری کەرکوك لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا، کە ئەمەش بە مانایەکی تر دەکاتە دیاری کردنی سنووری جوگرافی ئەم توێژینەوەیە.

**أ. هەلومەرجی کارگێری کەرکوك:**

دوای ئەوەی ناوچەکانی باشووری کوردستان لە دەمو ساتی جیاجیای نیوەی یەکەمی سەدەی شانزەهەمدا بوون بە بەشێك لە ئیمپراتۆریی عوسمانی، دەسەڵاتدارانی عوسمانی زۆربەی ئەم ناوچانەیان لە چوارچێوەی ویلایەتێکدا رێکخست کە ناوی (شارەزوور)یان لێنا چونکە لە سەرەتا مەڵبەندەکەی لەو دەڤەرەدا بوو[٤٨]، بەڵام لە کۆتایی سەدەی شازدەهەمدا عوسمانییەکان مەڵبەندی ئەم (ویلایەت)ەیان[٤٩] لە قەڵای (گوڵعەنبەر)ەوە [٥٠] گواستەوە بۆ کەرکوك، ئەمەش بە خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگ دادەنرێت لە مێژووی ئەیالەتەکەو هەروەها لە مێژووی شارەکەشدا، هۆکاری ئەم گواستنەوەیە دەگەرایەوە بۆ نزیکی سەنتەری پێشووی ئەیالەتەکە (گوڵعەنبەر) لە ئێرانەوە. ئەمەش وای کردبوو ئەم دەڤەرە ببێتە شانۆی سەرەکی زۆربەی شەرو کردە سەربازییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو سەفەوی[٥١]. ئیتر بەم گواستنەوەیە کاری ئەم ئەیالەتە لە رووبەرووبونەوەی ئێرانەوە گۆرا بۆ سەرپەرشتی کردنی دەڤەری فراوانی شارەزوور، ئەمە جگە لەوەی ناوچەی کەرکوك دەکەوێتە سەرە رێگەی سەرەکی هەردوو ویلایەتی بەغداو موسڵ[٥٢].

هەرچەندە ئەیالەتی شارەزوور بە درێژایی سەدەی حەڤدەهەم کێشی کارگێری خۆی پاراستو وەك یەکێك لە ئەیالەتە کوردییەکانی عوسمانی کە لە (٢٠) سەنجەق کەمتری لەخۆ نەدەگرت[٥٣]، بەڵام کێشو دەسەڵاتی ئەیالەتی شارەزوور لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەمەوە لە کەم بوونەوە دابوو، ئەمەش بە هۆی سەرهەڵدانو پەرەسەندنی میرنشینی بابان لە رۆژهەڵاتی ئەیالەتی شارەزووردا کە دەستی بەسەر هەندێ لە ناوچەکانی ئەم ئەیالەتە داگرت بە تایبەت لە سەردەمی (سلێمان بەبە)ی میری بابان وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا. هەروەها بەهێزبوونی ئەیالەتی بەغدا رۆڵی گرنگی

هەبوو لەسەر تەسکبوونەوەی سنوورو دەسەڵاتی ئەیالەتی شارەزوور بە تایبەت لە سەردەمی (حەسەن پاشا)ی والی بەغدادا (١٧٠٤-١٧٢٣)[٥٤].

پاشەکشەکردنی دەسەڵاتی ئەیالەتی شارەزوور لە سەردەمی حوکمی مەمالیکەکان لە بەغدا (١٧٤٩-١٨٣١)ی زایینی هەر بەردەوام بوو، بە تایبەتی لە سەردەمی (سلێمان پاشا)ی گەورەی والی بەغدا (١٧٨٠-١٨٠٢)ی زایینی، لەم سەردەمەدا والی ناوبراو یەکێك لەو ناوچەی بە شێوەی راستەوخۆ حوکمرانی دەکردو موتەسەلیمی بۆ دادەنا کەرکوك بوو[٥٥].

هاوکات لەگەڵ ئەمەدا سنووری کارگێڕی کەرکوك بە شێوەیەکی بەرچاو لە تەسك بوونەوەدابوو بە جۆرێك کاتێك نیبور لە ساڵی (١٧٦٦)ی زایینیدا سەردانی کەرکوك دەکات تێبینی ئەوە دەکاتو دەڵێت ئەم ئەیالەتە پێکهاتووە لە ((کەرکوكو چەند گوندێکی دەوروبەری))[٥٦]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەرکوك لەم ماوەیەدا پلەی ئەیالەتی خۆی لە دەست نەداوەو بە بەردەوامی والیەکەی لە پلەی میری میران نەهاتووەتە خوارێ، هەروەها دیوانی پاشای ئەم ئەیالەتە لە دیوانی والی ئەیالەتی بەغدا کەمتر نەبوو[٥٧].

هەلومەرجی کارگێڕی کەرکوك لە سەدەی نۆزدەدا رەوشێکی جیاوازی بەخۆوە بینی لە چاو سەردەمەکانی پێشوو، ئەوەی جێگەی سەرەنجە ئەم هەلومەرجە کارگێڕییە کەوتە ژێر کاریگەری بارودۆخی سیاسی لە ناوچەکەدا، بە تایبەتی کاریگەری دەسەڵاتی ئەیالەتی بەغدا لە ناوچەی کەرکوكو کاریگەری میرنشینی بابانو مەترسی ئێرانییەکانو فراوانخوازییەکانی (میر محەمەدی سۆران) لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا.

(ئەورەحمان پاشا)ی بابان (١٧٨٩-١٨١٢)ی زایینی یەکێك بوو لەو میرە بابانییانەی کە هەردەم کاریگەری بەسەر کەرکوکەوە هەبووەو هەندێ ناوچەی دەوروبەری کەرکوکی خستووەتە سەر میرنشینەکەی خۆی کە لە رووی دەسەڵاتو کارگێڕییەوە زۆربەی کات ئەم ناوچانە سەر بە کەرکوك بوون وەك ناوچەی (قەرەحەسەن) کە کەوتبووە رۆژهەڵاتی کەرکوكو لە زۆربەی کاتدا سەر بەم شارە بوو، بەڵام ناوبراو لە زۆربەی کردە سەربازییەکانیدا کردبووی بە بارەگای خۆی، هەروەها چەندین جار دەستی بەسەر ئاڵتون کۆپری داگرتبوو[٥٨]. جێگەی ئاماژەیە کە ئاڵتون کۆپری یەکێکە لە ناوچەکانی دەوروبەری کەرکوكو زۆربەی کات ئەم شارە لە رووی کارگێڕییەوە سەر بە دەسەڵاتی ئەیالەتی شارەزوور (کەرکوك) بووە، بەڵام لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا بە هۆی لاواز بوونی دەسەڵاتی ئەیالەتی ناوبراوو ئەو بارودۆخەی لە ناوچەکەدا هەبوو، پاشکۆیەتی کارگێڕی ئاڵتون کۆپری گۆڕانی زۆری بەخۆوە بینیوە. جگە لە دەست بەسەرداگرتنی (ئەورەحمان پاشا)و (میر محەمەدی سۆران) یش ماوەیەك خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

لە لایەکی تر مەترسی ئێرانییەکان یەکێك بوو لەو هۆکارانەی کە رۆڵی گرنگی بینیوە لە زیاتر وابەستەبوونی کەرکوك بە ئەیالەتی بەغداوە، ئەوەتا هێرشە بەردەوامەکانی لەشکری قاجاری لە ماوەی ساڵانی (١٨١٨)ی زایینیو (١٨٢١)ی زایینیدا وای لە والی بەغدا کرد زیاتر پەیوەست بێت بە بەرگری کردن لە ناوچەکانی ئەیالەتی شارەزوور لە دژی ئێرانییەکانو ئەمەش وای کردبوو ئەیالەتی ناوبراو لە رووی کارگێڕییەوە بەرە بەرە پاشکۆیەتی بۆ بەغدا زیاتر بێتو هەر بەغداش سوپای کەرکوك لە شەڕەکانیدا بەکاربهێنێت[٥٩]، بێجگە لە دانانی موتەسەلیم بۆ ئەیالەتی شارەزوور[٦٠]. زۆر لەو گەریدانەی لەو ماوەیەدا هاتوونەتە ناوچەکە تێبینی ئەوەیان کردووە، ئەوەتا (پێکینگهام) لە ساڵی (١٨١٦)ی زایینیدا دەڵێت: "شاری کەرکوك ملکەچ بووە بۆ دەسەڵاتی پاشای بەغدا"[٦١]. لە لایەکی تر (دوبریە)ی گەریدەی فەرەنسی کە لە ساڵی (١٨٠٨)ی زایینیدا هاتووەتە کەرکوك ئاماژە بەوە دەکات کە شاری کەرکوك لە ژێر فەرمانی والی بەغدایە، بۆیە شارەکە رووبەرووی چەندین هەڕەشەی والییەکانی بەغدا بووەتەوە، والی بەغدا موتەسەلیم بۆ شارەکە دادەنێتو شاری ناوبراو لە چوارچێوەی سنووری یاسایی ویلایەتی بەغدایە. ئەمە بێجگە لەوەی ناوبراو ئاماژەمان بۆ ئەوە دەکات کە پێشتر بابی عالی والی بۆ شارەکە داناوەو سەربەخۆ بووە[٦٢]. هەروەها گەشتیارێکی تری فەرەنسی بە ناوی (رۆسۆ) لە ساڵی (١٨٠٩)ی زایینیدا هاتووەتە ناوچەکە دەڵێت: "موتەسەلیمی کەرکوك لە چارەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا لەلایەن والییەکانی بەغداوە فەرمانیان پێ دەکرا بە دامەزراندنی هێڵی بەرگری دژی هێرشکاری کوردەکان بۆ سەر شارەکە"[٦٣]. هاوکات لەگەڵ ئەمەدا ئەو بارودۆخە سیاسیەی کە لە ناوچەکەدا هەبوو وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا وای کردبوو کەوا کەرکوك هەمیشە لە هێرشکارییەکانی ئەیالەتی بەغدا بەشداربێت لە کاتی پێویستدا[٦٤]. لەم بارەیەوە گەریدەی فەرەنسی (رۆسۆ) کە پێشتر ناومان هێنا باسی ئەوە دەکات کە لە کاتی داواکاری ئەیالەتی بەغدا لە ئەیالەتی شارەزوور، ئەمەی دوایی لە توانایدا بوو (٦٠٠) سەربازی پیادە بە چەکی سووکەوە بۆ پاشای بەغدا بنێرێ[٦٥].

ئەم زیاتر وابەستە بوونی کەرکوك بە بەغداوە کاریگەری هەبوو لەسەر کەم بوونەوەی سەنگو دەسەڵاتی ئەیالەتی شارەزوور لە بەرانبەر ئەیالەتی بەغدا بە تایبەتی لە سەردەمی دەسەڵاتی مەمالیکەکاندا تا لە ناوچوونی لە ساڵی (١٨٣١)ی زایینیدا. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەیالەتی بەغدا راستەوخۆ دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەندێ لە ناوچەکانی کەرکوکدا بسەپێنێت وەکو ناوچەی قەرەحەسەن. ئەوەتا جێنشینی بەریتانی (ریچ) لە ساڵی (١٨٢٠)دا هاتووەتە ناوچەکە دەڵێت: "قەرەحەسەن راستەوخۆ بە بەغداوە بەستراوەتەوەو دەسەڵاتی کەرکوکی بە هیچ شێوەیەك بەسەرەوە نییە"[٦٦]. بەڵام سەبارەت بە هەردوو ناوچەی شوانو لەیلان کە لە ناوچەکانی دەوروبەری کەرکوك بوون دەڵێ: "ئەوانە لە ژێر دەسەڵاتی کارگێڕی کەرکوکدا بوون لەو سەردەمەدا"[٦٧].

لە لایەکی ترەوە (میر محەمەدی سۆران) لە چوارچێوەی فراوانخوازییەکانیدا توانی لە ئاداری (١٨٢٤)ی زایینیدا دەست بەسەر پردێدا بگرێت کە یەکێکە لە ناوچەکانی دەوروبەری کەرکوكو[٦٨] تەنها (٤٦) کم لێوەی دوورە[٦٩].

تەنانەت فرایزەری گەڕیدەی ئینگلیزی کە لە ساڵی (١٨٣٤)ی زایینیدا هاتووەتە کەرکوك ئاماژە بەوە دەکات کە: "دەسەڵاتی میری سۆران لە هەولێرەوە درێژ دەبووەوە تا کەرکوك لە ڕۆژهەڵاتی دیجلە"[٧٠]. شایەنی باسە بیری دەستبەسەراگرتنی شاری کەرکوکیش لای (محەمەد پاشای میری سۆران) بوونی هەبووە[٧١]. هەرچۆنێك بێت دەسەڵاتی میری ناوبراو لە شارۆچکەی پردێدا مایەوە تاوەکو لەناوچوونی دەسەڵاتی لە ساڵی (١٨٣٦)ی زایینیدا[٧٢]. بەم شێوەیە ڕوون دەبێتەوە کە شارۆچکەی ناوبراو کە لە زۆربەی کاتدا سەر بە دەسەڵاتی کارگێڕی کەرکوك بوو بۆ ماوەی (١٢) ساڵ لە ژێر فەرمانڕەوایی میری سۆراندا بووە.

بە هۆی ناسەقامگیری بارودۆخی سیاسی لە ناوچەکەو ئەو گۆڕانکارییە زۆرو خێرایانەی کە ڕوویان دەدا، هەروەها لەبەردەست نەبوونی بەڵگەنامەی تایبەت لە بابەتەکە ناکرێ بە ووردی سنوورو دابەشبوونی کارگێڕی کەرکوك لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا دیاری بکەین. بەڵام سەبارەت بە نیوەی دووەمی هەمان سەدە مەسەلەکە جیاوازە، بە تایبەتی لە ڕووی سەرچاوەو بەڵگەنامەوە.

سەبارەت بە دەسەڵاتی کارگێڕی کەرکوك لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا توێژەرێکی تورك کە پشت ئەستورە بە بەڵگەنامەکانی عوسمانی بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە ئەو ناوچانەی لەنێوان ساڵانی (١٨٥٠-١٨٦٨)ی زایینیدا لە ڕووی کارگێڕییەوە سەر بە کەرکوك بوون لە (قەرەحەسەن، گۆپ تەپە[٧٣]، شوان، تازە خورماتوو[٧٤]، داقوق، بەشیر[٧٥]، جەباری[٧٦]، گل[٧٧]، کاکانلو[٧٨]، ئیفتیخار[٧٩]) پێکهاتبوون[٨٠]. ئەوەی لێرەدا جێگەی سەرەنجە ئەوا کە کەرکوك لەم ماوەیەدا سەرلەنوێ فراوان بووەتەوە لە ڕووی کارگێڕییەوە، لەبەر ئەوەی ناوچەکانی دەسەڵاتی کارگێڕی کەرکوك زیادیان کردووە، کە بێگومان هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئارام بوونەوەی ناوچەکە لە ڕووی سیاسیەوە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا[٨١].

دوای دەرچوونی یاسای ویلایەت[٨٢] لە دەوڵەتی عوسمانیدا لە (٨)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٨٦٤)ی زایینیدا شێوازی کارگێڕیی نوێ لە هەموو ناوچەکاندا پێڕەوکرا[٨٣]. سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەدەن کەوا لەم سەردەمەدا ئەیالەتی شارەزوور ئیتر وەك ئەیالەت هەبوونی نەما بەڵکو لەگەڵ ئەیالەتی موسڵ پێکەوە کۆکراونەتەوە لە ژێر ناوی ویلایەتی موسڵ. ئەمەش لە ساڵی (١٨٧٠)ی زایینیدا واتە لە سەردەمی (مەدحەت پاشا) لە عێراقدا[٨٤]. ئەوەتا سەرچاوەیەکی تورکی کە پشتی بە بەڵگەنامەکانی عوسمانی ئەستووره باس لەوە دەکات کە لە سەردەمی (مەدحەت پاشا)دا باری کارگێڕی کەرکوك بەم شێوەیە بوو:

| ویلایەت | سەنجەق | قەزا | ناحیە |
| --- | --- | --- | --- |
| موسڵ | شارەزوور (کەرکوك) | کەرکوك<br>هەولێر (ئەربیل)<br>ڕانیە<br>ڕەواندز<br>کفری (سەلاحیە)<br>کۆیسنجق | داقوق، ئاڵتون کۆپری، گل، شوان، مەلحە[85]، سوڵتانیە، دزەیی بێتواتە<br>هەریر، باڵەك، شێروان<br>قەرەتەپە، توزخورماتوو<br>بالیسان، شەقڵاوە[86] |

جێگەی سەرەنجە دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە بەرواری (٢٢)ی ئەیلولی ساڵی (١٨٧٢) بە فەرمانێکی رەسمی سەنجەقی سلێمانیان کرد بە قەزاو لە ڕووی کارگێڕییەوە بە کەرکوکەوە (سەنجەقی شارەزوور)لکاندیان، تەنانەت ئەم بڕیارە لە ڕۆژنامەی (زەورا)دا بە فەرمی بڵاوکرایەوە[٨٧]. بێگومان ئەمەش مانای ئەوەی دەگەیاند کە ئەو کات کەرکوك زۆربەی ناوچە کوردییەکانی باشووری کوردستانی لە ڕووی کارگێڕییەوە لەخۆدەگرت، بەڵام ئەم بڕیارە زۆری نەخایاندو جارێکی تر سلێمانی کرایەوە بە سەنجەقێکی سەربەخۆ[٨٨].

بێگومان لە ئەنجامی ئەم گۆڕانکارییە کارگێڕییانەی دوایی کە باسمان کرد ناوی ئەیالەتی شارەزوور کە مەڵبەندەکەی کەرکوك بوو، بە یەکجاری گۆڕا بۆ سەنجەقی شارەزوور هەروەها لیوای شارەزووریشیان پێ دەوت[٨٩]. دواتریش لە ساڵی (١٨٩٣)ی زایینیدا بەرپرسانی عوسمانی بە هۆی تێکەڵ بوونی ناوی سەنجەقی شارەزوور لەگەڵ (سەنجەقی ئەلزور) لە وڵاتی شام لە نوسراوە کارگێڕییەکاندا بە شێوەیەکی فەرمی ووشەی شارەزووریان هەڵگرت و لە جیاتی ئەو ناوی (کەرکوك)یان بەکارهێنا، بۆیە دەبینین سەنجەقی شارەزوور یان لیوای شارەزوور کە بۆ کەرکوك بەکار دەهات گۆڕا بۆ (سەنجەقی کەرکوك)[٩٠] ئەمەش بە گۆڕانکارییەکی گرنگ لە مێژووی شارەکەدا دادەنرێت.

دیارە هەلومەرج و دابەشبوونی کارگێڕیی کەرکوك تا کۆتایی سەدەی نۆزدەش گۆڕانکاری ئەوتۆی بەخۆوە نەبینی، ئەوەتا (شەمسەدین سامی) لە فەرهەنگەکەیدا لە ساڵی (١٨٩٦)ی زایینیدا سەبارەت بەو قەزایانەی سەر بە سەنجەقی کەرکوکن هەر ئەو شەش قەزایەی باس کردووە کە لە خشتەکەی پێشوودا ڕوون کراونەتەوە، بەڵام دەربارەی ئەو ناحیانەی سەر بە قەزای کەرکوکن باسی ئەوە دەکات کە شارەکە پێنج ناحیە لەخۆ دەگرێت[٩١]. هەروەها لە ساڵنامەی ویلایەتی موسڵی ساڵی (١٣٢٥ کۆچی/١٩٠٦-١٩٠٧)ی زایینیدا هاتووە کە قەزای کەرکوك پێنج ناحیەی هەیە کە بریتین لە ئاڵتون کۆپری و مەلحەو گل و داقوق و شوان[٩٢].

**ب. سیاسەتی دەسەڵاتداریێتی عوسمانی لە بەرانبەر دانیشتووانی کەرکوك:**

وا دیارە عوسمانییەکان بە چاوێکی پڕ بایەخەوە تەماشای کەرکوکیان کردووە، ئەمەش لە هێڵە سەرەکییەکانی سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی لە کەرکوکدا بەدیاردەکەوێت. یەکێك لە هۆکارە هەرە گرنگەکانی ئەو بایەخی شاری کەرکوك بۆ دەسەڵاتداریێتی عوسمانییەوە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کەرکوك مەڵبەندی ئەیالەتی شارەزوور بوو واتە ئەم شارە بایەخی کارگێڕی هەبوو.

هەروەها شوێنی جوگرافی کەرکوك یەکێك بوو لە هۆکارەکانی زیاتر بایەخ پێدانی کەرکوك لەلایەن دەسەڵاتدارانی عوسمانییەوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کەرکوك دەکەوێتە سەر ڕێگای ووشکانی بازرگانی نێوان ئێران و ئەو ناوچانەی کە دەکەونە سەر دەریای ناوەڕاست، ئەمە بێجگە لەوەی کەرکوك گرنگی جوگرافی و ستراتیژی هەبوو لەبەر ئەوەی پەیوەندی و جوڵانەوە بازرگانییەکان لەنێوان بابی عالی و ئەیالەتەکانی بەغداو بەسرا هەروەها سنووری دەوڵەتی عوسمانی و ئێران لە باشوورەوە[٩٣]. بێگوما لێرەدا روون دەبێتەوە کە هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافی کەرکوك بایەخی شارەکەی بۆ دەوڵەتی عوسمانی زیاتر کردووە.

لەلایەکی تر یەکێك لەو هۆکارانەی کە بایەخی کەرکوکی بۆ عوسمانییەکان زیاتر دەکرد بریتی بوو لە بوونی تورکمان لەم شارەدا، لەبەر ئەوەی شاری ناوبراو یەکێك بوو لە شارەکانی ناوچە کوردییەکان کە تورکمانی تێدا نیشتەجێ بوو، ئەمە بێجگە لەوەی لە سەردەمی عوسمانییەکاندا کەرکوك شارێکی سەربازی گرنگ بوو، ناوەندێك بوو بۆ دابین کردنی کارمەندانی دەوڵەت و جەندرمە[٩٤]. بۆیە دەبینین گەڕیدەی هۆڵەندی (بارۆن ئێدوار نۆڵدە) کە لە چارەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەدا هاتووەتە کەرکوك دەڵێت: "عوسمانییەکان بە چاوێکی تر دەیانڕوانییە کەرکوك بۆیە (٤٥٠٠) سەربازی دەوڵەتی تێدا مۆڵ درابوو"[٩٥]. بەڵام ئەگەر بگەڕێینەوە ڕووداوەکانی سەرەتای سەدەی نۆزدە دیسان سەرچاوە مێژووییەکانی ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە لەو سەردەمەشدا ژمارەی هێزی عوسمانی لە کەرکوکدا (٤٠٠٠) سەرباز بووە[٩٦]. لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە شاری کەرکوك شارێکی سەربازی بایەخدار بووە بۆ دەسەڵاتداریێتی عوسمانی و بە وێنەی مەڵبەندێك بووە بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی عوسمانی بە سەر کوردستانی باشووردا، بۆیە دەبینین زۆربەی جار کەرکوك خاڵی دەرچوون و دەست پێکردنی هێرشی سەربازی والییەکانی بەغدا بووە بۆ سەر ناوچە کوردییەکان وەکو دواتر لە ڕووداوە سیاسییەکاندا بۆمان ڕوون دەبێتەوە.

سەبارەت بە سیاسەتی عوسمانییەکان بەرانبەر بوونی تورکمان لە شاری کەرکوکدا، ئەوا دەبینین دەوڵەتی عوسمانی پشتگیری تورکمان و کەلتوری تورکمانەکان و هاتنی ئەوانیان کردووە بۆ ناوچەکە هەروەها پلەوپایەی بەرزیان لەلایەن عوسمانییەکانەوە پێ دەدرا[٩٧]، هەر بۆیە نیشتەجێ بوون و کۆبوونەوەی تورکمان[٩٨] لە شارەکە بایەخی کەرکوکی بۆ عوسمانییەکان زیاتر کردبوو[٩٩]. هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا بوونی تورکمان لە شارەکەدا دەبووە سوود وەرگرتنی لێیان بە تایبەتی لە بوارە کارگێڕییەکاندا، بێگومان کەرکوك مەڵبەندێکی کارگێڕی گرنگ بوو، بوونی تورکمانیش دەبووە هۆی زیاتر جێگر بوونی کارگێڕی عوسمانی و کارگێڕیی سەربازی لە شارەکەدا[١٠٠]. ئەمەش وای کرد کەرکوك لە سەردەمی عوسمانییەکاندا ببێت بە ئەمامگەیەك بۆ بەرهەمهێنانی فەرمانبەران بۆ دەوڵەتی عوسمانی[١٠١]. بۆیە دەبینین بوونی تورکمان لە شارەکەدا ئەم بوارانەی سەرەوەی بۆ دەوڵەتی عوسمانی فەراهەم کرد.

هەروەها ئەوەی یارمەتی دەربووو ڕۆڵی کارای بینی لە زیادبوونی ڕێژەی تورکمان لە شاری کەرکوکدا، بە تایبەتی دوای ئەوەی کەرکوك بووە بنکەی سەربازی بەردەوامی عوسمانییەکان وەکو پێشتر ئەمەمان سەلماندووە کە هەر لە سەرەتای سەدەی نۆزدەوە تاوەکو کۆتایی سەدەی ناوبراو ژمارەی سەربازانی عوسمانی لە شاری کەرکوکدا لە (٤٠٠٠) هەزار کەمتر نەبووە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی و هەندێ لە خێزانی سەربازو فەرمانبەرە مەدەنییەکان هێنا بۆ کەرکوك کە دواتر ئەمانە بووە بنکەی سەربازی و فەرمانبەرانی مەدەنی بە جۆرێك دەوڵەت بە تەواوی پشتی بەمەی دوایی بەستبوو بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ناوچەکە، بە تایبەتی ئەو فەرمانبەرانەی کە دەوڵەتی عوسمانی لە ئەستەمبوڵ دەیهێنان لە ناوچەکە جێگیری دەکردن[١٠٢]. لە ڕاستیدا هەبوونی ئەو ژمارە سەربازو خێزانەکانیان و ژمارەیەك فەرمانبەری مەدەنی سیمای دیمۆگرافی شارەکەیان هێندی هێندی گۆڕی.

لە لایەکی تر دەسەڵاتداریێتی عوسمانی دەستیان کرد بە پاڵپشتی کردنی هەندێ بنەماڵەی دەوڵەمەندو خاوەن موڵك و بازرگان لە شاری کەرکوکدا کە چەندین پلەی گرنگ و جیاوکی تایبەتیان پێ سپێردرا، لە دیارترین ئەو بنەماڵانەش بنەماڵەکانی (نەوتچی زادە) و (یەعقوبی زادە) و (ئاوچی و قیردار) بوون[١٠٣]. بۆیە دەبینین لە سەردەمی عوسمانی و ئینگلیزەکانیشدا لە ناو ئەم بنەماڵانە چەند پیاوێکی ناودار هەڵکەوت بە تایبەتی لە نێو بنەماڵەی نەوتچی زادە لەوانە (ساڵح پاشا نەوتچی) کە بووە نوێنەری کەرکوك لە یەکەم ئەنجومەنی مەبعووسان (پەرلەمان)ی عوسمانیدا[١٠٤].

(حاجی مستەفا قیردار) کە لە بنەماڵەی قیردار بوو، ناوبراو بۆ ماوەیەك سەرۆکی شارەوانی کەرکوك و ماوەیەکیش لە ئەستەمبوڵ ئەندامی (ئەنجومەنی مەبعووسان) بووە[١٠٥]. هەروەها بنەماڵەی ئاوچیەکانیش بۆ ماوەیەکی درێژ پلەی موتەسەلیمی کەرکوك بە دەستی ئەوانەوە بووە[١٠٦]. بەم شێوەیە ئەم بنەماڵانە مایەی بایەخی دەسەڵاتداریێتی عوسمانی بوونە لە کەرکوکدا کە بنەماڵەی دەوڵەمەندو خاوەن موڵك بوون و پاڵپشتی عوسمانییەکانیان کردووە. دەوڵەمەندیەکەشیان هەر لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە پیاوی سەر بە دەوڵەت بوون.

سەبارەت بە بارودۆخی کەمایەتییە ئاینییەکان کە لە شاری کەرکوکدا هەبوون هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێدابوو بە تایبەتی مەسیحی و جولەکەکان، ئەوا هەندێك لەو گەڕیدانەی هاتوونەتە کەرکوك هەندێ گوزارشی گرنگیان لە بارەی ژیان و هەلومەرجی گوزەرانی ئەم کەمایەتییە ئاینییانە بۆ تۆمارکردووین. لەوانە (پێکینگهام) کاتێك سەردانی شارەکەی کردووە باسی قەڵای کەرکوك و دانیشتووانی ناو قەڵاکە دەکات و ئاماژە بەوە دەدات کە خەڵکی ووتویانە ڕێگە بە خەڵکی ناموسڵمان نادرێت لەم بەشەی شارەکە دابنیشن و تێیدا نیشتەجێبن[107]. بەڵام ناوبراو ئەوەمان بۆ روون ناکاتەوە کە ئاخۆ دەوڵەت ڕێگر بووە لەم کارە یاخود خەڵکی، هەرچەندە پێدەچێت گەڕیدەی ناوبراویش لەم ڕوانگەیەوە زیادەڕۆیی کردبێت.

لە شاری کەرکوکدا گۆڕی هەندێ لە پێغەمبەرانی جولەکە هەبوو لەوانە (دانیال) و (مێکائیل) و (عوزێر) و (عازریە)، هەر بۆیە جووەکان وەکو مەراسیمێکی ئاینی تایبەت بە خۆیان ویستویانە سەردانی ئەم گۆڕانە بکەن و تێیدا بمێننەوە، بەڵام ڕێگە لەم کارەی جولەکەکان گیراوە، ئەوەتا (نیبور) کە لە ساڵی (١٧٦٦)ی زایینیدا هاتووەتە کەرکوك دەڵێت: "موسڵمانان ڕێگە لە جووەکان دەگرن سەردانی گۆڕی پێغەمبەرانیان بکەن"[108]. هەروەها (دکتۆر ئیڤن) بەر لە (نیبور) بە چەند ساڵێك (لە ساڵی ١٧٥٨)ی زایینیدا هاتووەتە کەرکوك باسی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە ویستوویەتی سەردانی گۆڕی (پێغەمبەر دانیال) بکات بەڵام ترساوە لەوەی ڕێگەی پێ نەدەن هەرچەندە خودی موتەسەلیمی کەرکوك کە باڵادەسترین بەرپرسی شارەکەیە و مەلایەکی موسڵمانیشیان لەگەڵدا بووە، بەڵام دواتر بەرپرسان پێیان گووتووە: "ئەم قەدەغەکردنە خەڵکی وەکو ئەوان ناگرێتەوە، بەڵکو تەنها فەلەکانی خەڵکی ئەو وڵاتە جێی مەبەستن"[109]. بێگومان بەم کارەش بواریان نەداون هەندێ مەراسیمی ئاینی خۆیان لە شارەکەدا جێبەجێ بکەن.

گەڕیدەی فەرەنسی (لیکلاما) کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا هاتووەتە کەرکوك و دەڵێت: "ڕێگە بە جولەکەکان نادرێت لەسەر گۆڕی پێغەمبەرانیان نوێژ بکەن"[110]. ئەمەش بەڵگەیەکی روون و ئاشکرایە کە بەرپرسانی عوسمانی لە کەرکوك ڕێگەی سەردانی کردنی گۆڕی پێغەمبەرانیان لە جولەکە و تەنانەت فەلەکانیش گرتووە.

سەبارەت بە سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی بەرانبەر بە هۆزە کوردییەکان، ئەوا دەبینین دەوڵەتی عوسمانی هەولی داوە دەسەڵاتی خۆی بەسەر هۆزە کوردییەکاندا بسەپێنێت جا ئەمە چ لە ڕێگەی هەڕەشە و گورەشەوە (التهدید) یاخود لە ڕێگەی دەم چەورکردنەوە (الترغیب) بووبێت. دەوڵەتی عوسمانی هەولی دەدا لە ڕێگەی بزواندنی هەستی ئاینی و مەسەلەی جیهادکردن هۆزە کوردییەکان بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاربهێنێت بە تایبەتی لە جەنگەکانی دژی ئێران و رووسەکان[111].

عوسمانییەکان چەند سیاسەتێکی تریان گرتەبەر بۆ ملکەچ پێکردنی هەندێ لە هۆزە کوردییەکان چونکە ئەم هۆزانە زۆربەیان چەکداربوون و جوڵانەوەو چالاکیان دژی دەوڵەت ئەنجام دەدا، لە لایەکی ترەوە دەوڵەتی عوسمانی هەولی دەدا سوود لە ناکۆکی نێوان هۆزە کوردییەکان وەربگرێت و هەوڵدان بۆ بەکارهێنانی هۆزێك دژی هۆزێکی تر لە کاتی بوونی ناکۆکی لەنێوان هۆزەکاندا[112]. ئەمە بێجگە لەوەی عوسمانییەکان هەندێ جار سیاسەتی دوور خستنەوەیان دژ بە هۆزە کوردییەکان بەکارهێناوە.

لە لایەکی تر بە هۆی ئەو بارودۆخەی لە ناوچەکەدا هەبوو کە خۆی لە مەترسی و هێرشی ئێرانییەکان و ئەو جوڵانەوانەی هۆزەکان دژ بە عوسمانییەکان دەیانکردو چەندین ئاژاوەی تری ناوخۆیی دەبینییەوە، دەبینین عوسمانییەکان چەندین هۆکاریان بەکارهێنا بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ناوچەکەدا لەوانە بەکارهێنانی کورد دژی کورد یاخود عەرەب دژی عەرەب، یان بەکارهێنانی سیاسەتی کورد دژی عەرەب یاخود عەرەب دژی کورد[113]. بێگومان ئەم سیاسەتەی کە عوسمانییەکان پێڕەویان دەکرد کاردانەوەی خراپی لەسەر بارودۆخی ناوچەکە دروست کردبوو کە دەبووە هۆی دروست بوونی ململانێ لەنێوان ئەیالەت و میرنشین و هێزە جیاجیاکانی تر لە ناوچەکەدا.

سەبارەت بە سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی لە بارەی کۆکردنەوەی باجەکاندا، ئەوا دەتوانین بڵێین ڕژێمی باجگری لە دەوڵەتی عوسمانیدا بەرهەمی سەدەها ساڵی ناتەواوی و کەم و کورتی ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و چینایەتی بوو کە بە فەرمانی سوڵتانەکان هاتبووەکایەوە، ئەمە بێجگە لەوەی زیادکردن و کەم کردنی باجەکان بەبێ ڕەچاوکردنی بارودۆخی خەڵکی بەڕێوەدەچوو، ئەمەش دەبوونە هۆی دروست بوونی چەندین دەردی کوشندە لە دەوڵەتی عوسمانیدا کە لە ئاکامدا گشت داموو دەزگاکانی دەوڵەتی پەککخستبوو[114]. بێگومان شاری کەرکوکیش کە یەکێك بوو لە شارەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی کە لە سیاسەتی باجگری عوسمانی بەدەر نەبوو، هەر بۆیە دەسەڵاتدارانی عوسمانی هەولیان دەدا توانای ئابووری خەڵکی دەڤەری کەرکوك وەك ناوچەکانی تری ژێر دەسەڵاتیان لە ڕێی ڕژێمی باجگری دادۆشن کە ڕژێمێکی گەندەڵ بوو، خەڵکەکەیان دەرووتاندەوە، بەڵکو زۆربەی ئەو باجانەی لە ناوچەکە دەستیان دەکەوت بۆ خەزێنەی دەوڵەت ڕەوانەیان دەکرد بەبێ ئەوەی هەوڵبدەن ئەو باجانە بۆ باری ئاوەدان کردنەوەی ناوچەکە خەرج بکرێت[115].

*** هەڵوێستی دانیشتووان و ڕەوتی ڕووداوەکان:**

**أ. تێڕوانین و هەڵوێستی دانیشتووان بۆ دەوڵەتی عوسمانی:**

لە بابەتی ڕابردوودا باسی سیاسەتی دەسەڵاتدارێتی عوسمانیمان کرد لە دەڤەری کەرکوکدا. بێگومان ئەم سیاسەتانەی باسمان کرد ڕەنگدانەوەی لەسەر تێڕوانین و هەڵوێستی دانیشتووانی ناوچەکە هەبوو بەرانبەر دەوڵەتی عوسمانی.

هەرچەندە لەو سەردەمەدا خەڵك ئامرازێکیان

لەبەردەستدا نەبوو بۆ دەربڕینی نارەزاییەكانیان بەتایبەتی نەبوونی هۆیەكانی ڕاگەیاندن، هەروەها تووندو تیژی دەسەڵاتدارانیش وای كردبوو خەڵكی نەتوانن بە ئاشكراو بە كردار بیروباوەڕو هەڵوێستی خۆیان دەربڕین، بەڵام لەگەڵ ئەو بارودۆخەشدا سەرچاوە مێژووییەكان هەندێ زانیاریمان لە بارەی هەڵوێست و تێڕوانینی خەڵكەوە بۆ دەسەڵاتداران بۆ ڕوون دەكەنەوە. ئەوەتا گەریدەیەكی هۆڵەندی كە لە چارەكی كۆتایی سەدەی نۆزدەدا سەردانی كەركوكی كردووە باسی ئەوەمان بۆ دەكات كە دانیشتووانی شارەكە هیچ جۆرە باوەڕو متمانەیەكیان بە دەوڵەتی عوسمانی نەبوو، و خەڵكی ناوچەكە ئەو پارانەی كە هەشیان بوو دەیانشاردەوە، بەڵام لەوانیە ئەگەر لە داهاتوودا دەوڵەتی عوسمانی لەناوبچێت و حكومەتێكی سەربەخۆو تایبەت بە خۆیان دابمەزرێت ئەوا دوور نییە خەڵكی پارە شاراوەكانیان بە داموو دەزگاكانی دەوڵەت بسپێرن[116]. بێگومان لێرەدا مەبەستی بەگەڕخستنی پارە نییە بەڵكو زیاتر مەبەستی نەبوونی متمانەیە كە ئەویش دەرەنجامی سیاسەتە چەوتەكانی دەسەڵاتداران بووە.

كاتێك كەركوك وەكو سەنجەقێك خرایە سەر ویلایەتی موسڵ، لەم كاتەدا شێخ ڕەزای شاعیر[117] لە دێرە شعرێكدا كە بە زمانی توركی دایڕشتووە وەكو هەڵوێستێك بەرانبەر ئەم گۆڕانە گوزارشت لە ناخی خۆی دەكات و خەڵكیش لەو مەترسیە ئاگادار كردووەتەوەو بەرجەستەی هەڵوێستی خەڵكی كردووە لە بەرانبەر دەوڵەتی عوسمانی لە شیعرەكانیدا بەتایبەتی لە بارەی گۆڕانكاری كارگێڕییەوەو كردنی كەركوك بە پاشكۆیەك بۆ موسڵ، ئەمە جگە لەوەی شاعیر لەم دێرە شیعرییەدا ناوی والیە تازەكە دەهێنێت كە (نافیع ئەفەندی)یە، پێدەچێت شاعیر ئەم والیەیی وەك كەسێكی گەندەڵ و خراپ ناسیبێت، بۆیە دەڵێت:

موصل اولدی ولایت، نافع افندی والی
ویل لكم رعیه، كول باشوه اهالی

واتە:

موسڵ بووە مەڵبەندی ویلایەت (نافع ئەفەندی)یش بووە والی نەگبەت خۆی ڕەعیەت، قوڕ بەسەر خەڵكەكەی[118].

شایەنی باسە بەهۆی نەبوونی چاودێری و لێپرسینەوە لە كارمەندانی دەوڵەت دیاردەی وەرگرتنی بەرتیل لە فەرمانگەكانی دەوڵەتی عوسمانی لە شاری كەركودا باوبووە، هەر بۆیە (شێخ ڕەزا) لە شیعرێكی تردا ڕەخنەی تووندی لە فەرمانگەی دادوەری (عدلیة) گرتووە. لەبەر بوونی دیاردەی بەرتیل خۆری كە فەرمانبەرانی فەرمانگەی ناوبراو وەریان گرتووەو دەڵێت:

خبرك وارمی؟ آلمنش. نه آلمنش؟ رشوت
آلنان شی نه ایمش؟ لیره، آلان كیم؟ هیئت

دەقی شیعرەكەی بە زمانی كوردی:
ئاگات لێیە؟ وەرگیراوە. چی وەرگیراوە؟ بەرتیل
ئەوەی وەرگیراوە چی بوو؟ لیرە، كێ وەری گرتووە؟ هەیئەت[119].

هۆزو عەشایرەكانی ناوچەی كەركوك وەك نارەزاییەك لە بەرانبەر دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە كەركوكدا چەندین جار چوونەتە پاڵ بزوتنەوەكانی پاشای بابان بە تایبەتی (ئەورەحمان پاشا)ی بابان كە لە داهاتوودا باسیان دەكەین. بێگومان ئەمەش هەڵوێستێكی گرنگی هۆزەكانی ناوچەكە بوو دژ بە دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە دەڤەری كەركوكداو هەروەها چەند هۆكارێكیش كاریگەرییان لەسەر هەڵوێستی هۆزەكان هەبوو لەوانە زۆری ڕێژەی باج و پیتاكی سەپێنراو بەسەر هۆزەكاندا، زوڵم و زۆرداری هەندێ لە فەرمانبەرانی تورك و زیادەڕۆیی كردنیان لە كۆكردنەوەی باجەكاندا، لەلایەكی تر دەوڵەتی عوسمانی تەنها هەوڵی ئەوەی دەدا دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێت بە بێ ئەوەی هیچ جۆرە هەنگاوێك بنێ بۆ چارەسەركردنی ئەو كێشانەی لە ناو خەڵكدا پەرەیان سەندبوو بە تایبەتی هەژاری و نەخۆشی و نەزانی، ئەمە بێجگە لەوەی ڕێگاو بانەكان كەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی ئاغاو هەندێ لە پیاوانی دەوڵەت لە ناوچە جیاجیاكان كە بە ئارەزووی خۆیان ڕەفتاریان دەكرد بە بێ ئەوەی دەوڵەت دەست لە كاروباریان وەربدات[120].

**ب. ڕەوتی ڕووداوە ڕامیارییەكانی كەركوك لە سەدەی نۆزدەدا:**

لەم سەردەمەدا چەند ڕووداوێكی سیاسی گرنگ ڕوویان داوە دوورو نزیك ئەم ڕووداوانە كاریگەری گرنگیان بەسەر كەركوك هەبووە، سەرەنجام ناوچەكە چەندین شەڕو شۆڕو ئاژاوەی سیاسی بەخۆیەوە بینیووە، لە ئاكامیدا مەترسی هەریەك لە ئێران و ئەیالەتی بەغداو كاریگەری میرنشیە كوردییەكان لەسەر كەركوك دروست بوون. بۆیە هەوڵ دەدەین لە ڕەوتی ئەم ڕووداوە گرنگانەو كاریگەرییەكانیان لە سەدەی ناوبراودا لەسەر كەركوك ڕوون بكەینەوە.

**١. بزوتنەوەكانی (ئەورەحمان پاشا)ی بابان و كەركوك:**

لە سەردەمی ئەم میرەدا، ناوچەكە چەند ڕووداوێكی بەخۆیەوە بینیوە، بە تایبەتی شەڕەكانی نێوان (ئەورەحمان پاشا)ی بابان[121] و هەندێ لە والییەكانی بەغداو ئەم ڕووداوانەش پەیوەندییان بە ناوچەی كەركوك هەیە.

گرنگترین ئەو ڕووداوانە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (عەلی پاشا)ی والی بەغدا (١٨٠٢-١٨٠٧)ی زایینیدایە، كاتێك هەریەك لە (جاسم بەگی شاوی) سەرۆكی هۆزی بەنی حەمدان و عەشایرەكانی عوبێد لە ساڵی (١٨٠٥)ی زایینیدا دژی والی بەغدا بزوتنەوەیەكیان بەرپاكرد، دواتر توانیان ڕابكەن و خۆیان بۆ ناوچەی خاپوور[122] دەرباز بكەن[123]. بۆیە (عەلی پاشا)ی والی بەغدا داوای لە (ئەورەحمان پاشا)ی بابان (١٧٨٩-١٨١٢)ی زایینی و (محەمەدی پاشا)ی فەرمانڕەوای كۆیەو هەریر كرد لە كەركوك خۆیان كۆبكەنەوەو هێزەكانیان بەرەو خاپوور ببەن بۆ لێدانی هەڵگەڕاوەكان، بەڵام لەم كات و ساتەدا (ئەورەحمان پاشا)ی بابان محەمەد پاشای فەرمانڕەوای كۆیەو هەریری كوشت، ئەمەش لەبەر بوونی دوژمنایەتی كۆن لەنێوانیاندا، دوای

ئەمە (ئەورەحمان پاشا)ی بابان بەرەو کەرکوك کشایەوەو لەگەڵ سەربازەکانیدا دەستیان کرد بە هێرشکردنە سەر هەندێ لە گوندەکانی دەوروبەری کەرکوك، لە ئاکامدا زیان بە ناوچەکە گەیشت‌و هەندێ باخچەو ناوچەی کشتوکاڵیان وێران کران[١٢٤]، هەر بۆیە موتەسەلیمی کەرکوك لای والی بەغدا سکاڵای دژی (ئەورەحمان پاشا)ی بابان کرد[١٢٥]. لە راستیدا ئەم بزوتنەوەیەی (ئەورەحمان پاشا)ی بابان پێدەچێت دژی ناحەزانی خۆی لە ناوچەی کەرکوك ئەنجامی دابێت هەروەکو ئەوەی دژی (محەمەد پاشا)ی فەرمانڕەوای کۆیەو هەریر ئەنجام درا.

دواتر (عەلی پاشا)ی والی بەغدا خۆی گەیاندە ناوچەی کەرکوك‌و بڕیاری دا بە لابردنی (ئەورەحمان پاشا)ی بابان لە فەرمانڕەوایەتی بابان‌و (سلێمان بەگی نەوەی ئەحمەد پاشا)ی بابانی کردە فەرمانڕەوای بابان، هەروەها هەریەك لە (خالید کەهیەی کەتخودا)و[١٢٦] موتەسەلیمی بەسرە (حاجی عەبدوڵڵا ئاغا)ی دەست گیرکرد کە لەگەڵ (ئەورەحمان پاشا)ی بابان رێکەوتنیان هەبوو[١٢٧]. پاشان والی بەغدا داوای لە (خالید بەگی برای ئیبراهیم پاشا)ی بابان‌و فەرمانڕەوای موسڵ‌و هەولێر کرد کە هێرش بکەنە سەر (ئەورەحمان پاشا)ی بابان کە والی ناوبراو بەیاخی بووی لە قەڵەم دەدا[١٢٨]، لەم کاتەشدا کە پاشای بابان بارەگاکانی خۆی لە نزیك قەرە حەسەن دانابوو، کە ئەم ناوچەیەش هەر بەشێ بوو لە کەرکوك، بەڵام (ئەورەحمان پاشا)ی بابان لە رێگەی ئەو چاوساغانەی کە دای نابوون زوو توانی بە هاتنی (خالید بەگ) بزانێت[١٢٩]. بۆیە کاتێك هێزی (خالید بەگ) گەیشتە پردێ (ئەورەحمان پاشا)ی بابان بەسەریدادا‌و زۆرێك لە سوپاکەی کوشت بەڵام (خالید بەگ) خۆی دەربازی بوو[١٣٠].

لەدوای ئەمە میری بابان توانی دەست بەسەر شارۆچکە پردێ دابگرێت، هەربۆیە والی بەغدا بە خێرایی خۆی گەیاندە کەرکوك‌و سەربازگەی تێدا دانا ئەمەش وەکو خۆ ئامادەکردنێك بۆ هێرش کردنە سەر پاشای بابان، بەڵام (ئەورەحمان پاشا)ی بابان دەست پێشخەری کردو هێرشی کردە سەر والی بەغدا لە کەرکوك کە لە ئاکامدا شکستی خواردو بە ناچاری کشایەوە دەربەندی بازیان[١٣١]. بەم شێوەیە هاتنی والی بەغدا (ئەورەحمان پاشا)ی بابانی ناچارکرد لە کەرکوك بکشێتەوە، کە کردبوویە بنکەی خۆی، دواتر والی بەغدا دەستی کرد بە لێدانی ئەوانەی یارمەتی پاشای بابانیان داوەو پاش ئەمە هێرشی کردە سەر هاوپەیمانانی ناوبراو لە هەولێرو دەستی بەسەر شارەکەدا گرت‌و بە دەسکەوتێکی زۆرەوە گەڕایەوە کەرکوك[١٣٢] پاش ئەوەی والی بەغدا بە توندی دژی هاوپەیمانانی (ئەورەحمان پاشا) وەستا، دواتر رووی کردە دەربەندی بازیان هەرچەندە پاشای بابان بەرگری کرد بەڵام خۆی بۆنەگیراو رای کردە وڵاتی ئێران لە ساڵی (١٨٠٥)ی زایینیدا[١٣٣]. ئەوەی لێرەدا جێگەی تێرامانە کە (ئەورەحمان پاشا)ی بابان پەیوەندی توندی بە ناوچەی کەرکوکەوە هەبووە، تەنانەت ناوچەکەی وەکو سەربازگەیەك لێکردبوو بۆ کردە سەربازی‌و راپەڕینەکانی لە دژی ویلایەتی بەغدا، ئەمە بێجگە لەوەی ناوبراو هاوپەیمان‌و دۆستی لە ناوچەکەدا هەبوون کە یارمەتی دەری بوون لە جوڵانەوەکانی لە ناوچەکە.

لە سەردەمی والی بەغدا (عەبدوڵڵا پاشای مەملوکی) دا (١٨١٠-١٨١٣)ی زایینی پەیوەندی نێوان (ئەورەحمان پاشا)ی بابان‌و والی ناوبراو رووی لە ساردبوونەوە کرد، ئەمەش بەهۆی ئەوەی هەریەك لە والی بەغداو حاکمی کرماشان (محەمەد عەلی میرزا) جیاواز لەگەڵ (ئەورەحمان پاشا)ی باباندا دەیانویست (عەبدول فەتاح پاشا)ی حاکمی باجەلان بگەڕێننەوە سەر کارو ناوچەکەی خۆی، بەڵام (ئەورەحمان پاشا)ی بابان بەمە رازی نەبوو، لە ئاکامی ئەمەدا هاوپەیمانییەك لەنێوان والی بەغداو حاکمی کرماشان دژی پاشای بابان دروست بوو، بڕیاریاندا لەسەر دانانی (خالید پاشا)ی بابان بە فەرمانڕەوایی بابان هەر بۆیە حاکمی کرماشان سوپایەکی شەش هەزار کەسی ئامادەکرد بۆ هاتنەناوەوە بۆ کوردستان. لە بەرانبەردا (ئەورەحمان پاشا)ی بابان سوپایەکی هاوشێوەی بە سەرکردایەتی (سلێمان پاشا)ی کوری خالید پاشا ناردە زەهاو بۆ لێدانی (محەمەد عەلی میرزا) بەڵام ئەم سوپایە خیانەتی کردو چووە پاڵ دوژمن، هەر بۆیە کاتێك (محەمەد عەلی میرزا) بە سوپاکەیەوە هاتە کوردستان (ئەورەحمان پاشا)ی بابان بە ناچاری سلێمانی بەجێهێشتو چووە کۆیە، کە لە ئاکامدا (محەمەد عەلی میرزا) لە شاری کۆیەدا گەمارۆیەکی توندی خستە سەر پاشای بابان[١٣٤] بەڵام لە پاشاندا (عەبدوڵڵا پاشا)ی والی بەغدا بۆی روون بووەوە کە چەند هەڵەیەکی گەورەی کردووە، چونکە ئەگەر هێزی ئێران بەسەر (ئەورەحمان پاشا)ی بابان زاڵ بێت‌و شاری کۆیە داگیر بکات ئەوا یەکسەر حاکمی کرماشان بیر لە داگیرکردنی شاری کەرکوکیش دەکاتەوە[١٣٥]. ئەوەی لێرەدا بۆمان روون دەبێتەوە ئەوەیە کە شاری کەرکوك گرنگییەکی زۆری هەبوو، رۆڵێکی سەربازی کارای دەگێرا سەبارەت بە ویلایەتی بەغدا، ئەمە بێجگە لەوەی والییەکانی بەغدا کردبوویانە سەربازگەی خۆیان سوودی گرنگی لە کردارە سەربازییەکانیاندا لێوەرگیراوە، هەربۆیە پاشای ناوبراو بۆی روون بووەوە کە داگیرکردنی شاری ناوبراو تەرازووی هێزی لە بەرژەوەندی ئەواندا نابێت، شاری کەرکوك لە رووی کارگێڕیشەوە بایەخدار بوو چونکە پایتەختی ئەیالەتی شارەزوور بوو.

(عەبدوڵڵا پاشا)ی بەغدا لەم کارەی پەشیمان بووەوە چونکە ناوبراو بۆی دەرکەوت پشت بەستن بە هێزی دەرەکی بۆ چارەسەری کێشە ناوخۆییەکان کارێکە لە جێگەی خۆیدا نییە[١٣٦]، ئەمە جگە لەوەی والی ناوبراو پێی وابوو کە هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئێرانییەکان هیچ مانایەکی بۆ نامێنێتەوە ئەگەر ئەوان کەرکوك داگیر بکەن، ئەوا ئێرانییەکان لەم کاتەدا هیچ جۆرە یارمەتییەکی ناکەن بە هۆی هاوپەیمانی نێوانیان[١٣٧]، بۆیە والی بەغدا لە کارەکانی خۆی پاشگەزبووەوەو بە فەرمانێك داوای لە هۆزە کوردەکان کرد یارمەتی پاشای بابان بدەن دژی ئێرانییەکان[١٣٨]. داوای لە بەکرێگیراوو لایەنگرانی خۆی کرد پابەند بن بە یارمەتی پاشای بابانەوە[١٣٩]. بەم شێوەیە پاشا تێکچوونی ئەم

هاوپەیمانییەتییە حاکمی کرماشان گەڕایەوە وڵاتەکەی[١٤٠]. ئەمەش بووە هۆی کۆتای هێنان بەو مەترسیەی کە گومان دەکرا لەسەر کەرکوك دروست بێت بە هۆی هاوپەیمانی نێوان والی بەغداو حاکمی کرماشان.

**٢. کەرکوك و گەیشتنی (داود پاشا)ی مەمالیك بۆ پۆستی ویلایەتی بەغدا:**

یەکێك لە ڕووداوە گرنگەکانی ئەو ماوەیە بریتی بوو لە ڕۆڵی کەرکوکییەکان لە گەیشتنی (داود پاشا)[١٤١] بە پۆستی ویلایەتی بغدا لە ساڵی (١٨١٦)ی زایینیدا.

(داود پاشا) دوای بەجێهێشتنی بەغدا[١٤٢] ڕووی کردە کەرکوك، دوای ئەوەی گەیشتە ناحیەی زەنگاباد خەڵکی بە گەرمی پێشوازیان لێ کردو ڕێزو لایەنگری خۆیان بۆ دەربڕی، دوای مانەوەیەکی چەند ڕۆژە لەم ناوچەیەدا خۆی گەیاندە کەرکوك[١٤٣]. لەم کاتەدا هەرچەندە شاری کەرکوك بە ئاژاوەیەکی ناوخۆیدا تێپەڕ دەبوو، ئەمەش بە هۆی ئەوەی (سەعید پاشا)ی والی بەغدا لە ژێر کاریگەری جێگرەکەی چەندین کەس لە پلەوپایەکانیان لادران، هەر بۆیە زۆرێك لە کاربەدەستانو خەڵکی شارەکە دژی (سەعید پاشا) وەستان[١٤٤]، بەتایبەتی کە (سەعید پاشا)[١٤٥] هیچ هەوڵێکی نەدا بۆ لابردنی ئەو ئاژاوەیەی کەرکوکی گرتبووەوە، ئەمە بێجگە لە خراپی بەڕێوەبردنی کارگێڕی لە شارەکەدا هەر بۆیە خەڵکی پشگیریو لایەنگری خۆیان بۆ (داود پاشا) دەربڕی، لە ئاکامدا خەڵکی لە ئابی (١٨١٥) دژی (سەعید پاشا) ڕاوەستانو ئاغای ئینکشاریو (یەنیچەری)و[١٤٦] هەندێ لە شوێنکەوتوانی ئەویان لە شارەکەدا کوشت، ئەمەش سەرەتایەك بوو بۆ زیاتر دروست بوونی ئاژاوە کە پاشان شارەکانی تریشی گرتەوە[١٤٧]. دواتر (داود پاشا) ڕووی کردە شاری سلێمانیو (مەحمود پاشا)ی بابان بە گەرمی پێشوازی لێکردو بڕیاری یارمەتی دانی خۆی بۆ (داود پاشا) ڕاگەیاند چونکە (مەحمود پاشا) یەکێك بوو لەو کەسانەی کە (سەعید پاشا) بڕیاری لەسەر کارلادانی بۆ دەرکردبوو[١٤٨].

دوای چوونی (داود پاشا) بۆ سلێمانی بارەگای تێدا داناو چەند کەسێك لە دەوری کۆبوونەوەو لەوانەش موتەسەلیمی پێشووی کەرکوك و بەسراو کەوتنە پڕوپاگەندە کردن دژی (سەعید پاشا)[١٤٩]، خەڵکی کەرکوك و ئەو هێزەی کە لە کەرکوك بوو بڕیاری دڵسۆزیان بۆ (داود پاشا) ڕاگەیاند، هەر بۆیە ناوبراو دوای مانەوەی بۆ ماوەی چل ڕۆژ لە سلێمانی ڕووی کردە کەرکوك و لەو دەڤەرە لە ناوچەیەك بە ناوی (قزل دگیرمن) هەوارگەی خۆی دانا، دواتر موتەسەلیمی کەرکوك (حاجی مەعروف ئاغا) هاتە پێشوازی (داود پاشا)، پاشان هەریەك لە قازیو موفتیو نەقیبو ئەشرافەکانو تەواوی زانایانو ئاڵای بێگیو[١٥٠] خۆبەخشەکان هەموویان هاتنە پێشوازیو ئەمانە پێشبرکێیان دەکرد لە پێشوازیو دەربڕینی لایەنگرییان بۆ (داود پاشا)، دواتر خەڵکی لە چینە جیاجیاکانی تر هاتن بۆ دەربڕینی لایەنگری خۆیان[١٥١].

جێگەی ئاماژەیە (داود پاشا) لە شاری کەرکوکدا زۆر بە گەرمی پێشوازی کراو بە جۆرێك مێژوونووس (حوسێن نازم بێگ) لەم بارەیەوە زێدەڕۆیی دەکاتو دەڵێت: "لە شارەکەدا کەس لە بەڵێن دانو موبایەعەی (داود پاشا) دوانەکەوت"[١٥٢]. لەگەڵ ئەوەشدا کەسی وا هەبوون لە کەرکوکدا ئامادە نەبوون بچنە پاڵ داود پاش، ئەوەتا دوابەدوای ئەم پێشوازییە گەرمەی (داود پاشا) لە شاری کەرکوکدا، ناوبراو بۆ بەهێزکردنی ڕیزەکانی داوای لە (عەبدوڵڵا پاشا)ی میری پێشوی بابان کرد بێتە پاڵی کە ئەوکات لە کەرکوك دادەنیشت، بەڵام ناوبراو ئەمەی ڕەت کردەووە بەڵکو لەگەڵ لایەنگرانی گەڕانەوە بۆ بەغدا لە کاتی گەڕانەوەشیدا چەند گوندێکی تاڵان کرد[١٥٣]. بەڵام دواتر لە ڕیزەکانی (داود پاشا) فیتنەو ئاژاوە دروست بوو، ئەمەش بە هۆی هاتنی فەرمانێك لە ئەستانەوە کە (ئەحمەد بەگی) برای شیریی (داود پاشا) وەکو والی بەغدا دەناساند، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی هەندێ لەو هێزانەی لە دەورو پشتی (داود پاشا) بوون لێی دوورکەونەوە[١٥٤]. سەرەتا کاتێك فەرمانەکە گەیشتە دەست (ئەحمەد بەگ) لە ترسی (داود پاشا) فەرمانەکەی شاردەوەو چاوەڕێی دەرفەتی دەکرد بۆ ڕاگەیاندنی پاشایەتی، هەر بۆیە کاتێك بینی (داود پاشا) هێزی ناردووە بۆ دەست بەسەرداگرتنی کۆیەو هەریر خۆی گەیاندە کەرکوك و دەقی فەرمانەکەی بۆ کەرکوکییەکان ئاشکرا کردو داوای لێکردن لە ژێر فەرمانی ئەودا کار بکەن چونکە ناوبراو لەلایەن سوڵتانەوە کراوە بە والی، بۆیە خەڵکی کەرکوك گوێڕایەڵیان کرد[١٥٥]، دواتر (ئەحمەد بەگ) بە یارمەتی کەرکوکییەکان دەستی کرد بە وەرگرتنی ئامادەکاری پێویست بۆ ڕوو بەڕووبوونەوەی (داود پاشا)و بۆ ئەوەی بەهێز ڕێگە لە پێشکەوتنی ڕیزەکانیان بگرێت[١٥٦]، لە ئاکامدا توانی سوپایەك لە کەرکوکییەکان دروست بکات بۆ لەناوبردنی (داود پاشا)[١٥٧].

کاتێك (داود پاشا) لەم بارودۆخە ئاگادار بووەوە بۆ ڕێگرتنو زیاتر ئاڵۆز نەبوونی بارودۆخەکە چوار هەیئەتی پێکهێناو ناردنی بۆ لای کەرکوکییەکان بۆ ئامۆژگاری کردنیان، بەڵام ئەم هەیئەتانە بە جنێوو قسەی ناخۆش لە شارەکە دەرکران، بۆیە ناوبراو نەیتوانی هیچ جۆرە ئامانجێکی دیار بەدەست بهێنێت پاش ئەوەی کەرکوکییەکان بە سەرکردایەتی (ئەحمەد بەگ) بە چوار تا سێ هەزار سەربازەوە دەستیان کرد بە هێرش بردن بۆ سەر (داود پاشا)، ئینجا ناوبراو داوای کرد تەمبێ بکرێن، لە ڕاستیدا بەرپەرچدانەوەی هێزی کەرکوك لەلایەن بابانیو سلێمانییەکانەوە بوو، پاش ئەوەی هێزی کەرکوکییەکان زۆربەیان کوژراو بریندار بوون ئەوانی تریان ڕایان کرد، بەڵام (مەحمود پاشا)ی بابان ڕێگەی بە هێزەکەی نەدا بچنە ناو شاری کەرکوکەوە، دواتر لە دووری سێ سەعات لە کەرکوك لە گوندی تۆخماخلو سەربازگەیان دانا، ئەمەش لەبەر ئەوەی نەوەکو شارەکە تووشی تاڵانو وێرانکاری بێتەوە لەلایەن هێزەکەیەوە[١٥٨]. بەم شێوەیە (داود پاشا) بە یارمەتی (مەحمود پاشا)ی بابان توانی هێزی کەرکوکییەکان تێك بشکێنێت کە لە ئاکامدا کۆمەڵیان تێك چوو، بڵاوەیان لێکرد.

شایەنی باسە دوای ئەم شەڕە لە کانونی یەکەمی ساڵی (١٨١٦)ی زایینی فەرمانی دووەم لە ئەستانەوە گەیشت کە تیایدا (داود پاشا)ی کردە والی بەغدا، بەم شێوەیە بارودۆخەکە ئارام بووەوە[١٥٩]. پاش ئەمە خەڵکی کەرکوك چوونە لای (داود پاشا)و داوای لێبوردنیان لێکرد[١٦٠]، پێیان ڕاگەیاند کە هۆی سەرهەڵدانی ئەو بارودۆخە بە هۆی جیاوازی لەنێوان دوو فەرمانەکەی ئەستانەوە دروست بوو[١٦١]، هەروەها پۆزشی ئەوەیان هێنایەوە کە زۆربەی گەورەکانی کەرکوك ئاگادار نەبوونە لەو هێرشانەی کە (ئەحمەد بەگ) بۆ سەر (داود پاشا) ڕێکیخستبوون، هەر بۆیە (داود پاشا) داوای پۆزشی ئەوانی قبوڵ کردو کەرکوکییەکانیش ڕاستگۆیی خۆیان بۆ (داود پاشا) سەلماند پاش ئەوەی چوونە پاڵ سەربازگەی (داود پاشا) لە تۆخماخلو[١٦٢]. ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێ کە کۆمەڵێك خەڵك لە شاری کەرکوك پاڵپشتی (ئەحمەد پاشا)یان کردووەو ئەمەش بەهۆی نەبوونی بەرژەوەندیان لەگەڵ (داود پاشا)دا، هەروەك پێشتر ئاماژەمان کرد بۆ ئەوەی کە هەندێك خەڵك لە شارەکەدا ئامادە نەبوون بچنە پاڵ (داود پاشا).

دوای ئەمە (داود پاشا) بۆ بەغدا بەرێکەوت بۆ لەناوبردنی (سەعید پاشا)ی والی بەغدا[١٦٣]. ئەمەی دواییش خۆی ئامادەکرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی (داود پاشا)، بەڵام ئەوەی کە لێرەدا بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیە کە (سەعید پاشا) لەلایەن خۆیەوە ویستی سوود لە کەرکوکییەکان وەربگرێت ئەمەش بە هۆی ئەو هەڵگەڕانەوەیەی کە خەڵکی کەرکوك دژی (داود پاشا) ئەنجامیان دا، بۆیە (خالید پاشا)ی بابان دەچێتە کەرکوك‌و لەگەڵ سوارەی کەرکوك بڕیاری یەکگرتن دەدەن، لە لایەکی تر پاش ئەوەی (عەبدوڵڵا پاشا)ی بابانیش گەیشتە کەرکوك ئەویش چووە پاڵیان، ئەمەش بۆ ئەوەی بە هەموو لایەکیان هێرشێکی هاوبەش بۆ سەر سلێمانی ئەنجام بدەن، چونکە لەم کاتەدا (مەحمود پاشا) سلێمانی بەجێ هێشتبوو لە پاڵ (داود پاشا) بەرەو کەرکوك بەڕێ کەوتبوو، براکەی (حەسەن پاشا)ی بە سەد سوارەوە لە شارەکە دانابوو، بۆیە (عەبدوڵڵا پاشا)ی بابان توانی هەزار جەنگاوەر لە کەرکوکدا کۆبکاتەوەو هێرش بکاتە سەر سلێمانی‌و گەمارۆی بدات. بەڵام پاش چەند ڕۆژێك گەمارۆدان سەرکەوتوو نەبوو بۆیە گەڕایەوە بەغدا[١٦٤].

دوای سەرکەوتنی شۆڕشەکەی (داود پاشا)و کوشتنی (سەعید پاشا)ی والی بەغدا لە ساڵی (١٨١٦)ی زایینیدا، بڕیاری لێبوردنی دا بۆ ئەو کەرکوکی‌و کەسایەتیانەی بنەماڵەی بابان کە دژی ئەو شۆڕشیان کردبوو[١٦٥].

ئەوەی لێرەدا جێگەی تێڕامانە ئەوەیە کە خەڵکی کەرکوك لەلایەن هەریەك لە (داود پاشا)و (ئەحمەد بەگ) و تەنانەت (سەعید پاشا)ش سوودیان لێ بینرا بۆ مەرامە سیاسییەکانی خۆیان، دواتر دەبینین دابەشبوونی لایەنگری خەڵکی بۆ ئەم سێ کەسایەتییە بە زیانی کەرکوکییەکان کۆتای هات‌و لە ئاکامدا ئەوان بوونە سوتەمەنی ئەم شەڕو هەرایە. بێگومان ئەمەش سادەیی خەڵکی شارەکە بەدیار دەخات لەو سەردەمەدا.

**٢. کەرکوك‌و هەڕەشەکانی ئێران:**

دوای هاتنی (داود پاشا) (١٨١٦-١٨٣١)ی زایینی بۆ سەر دەسەڵات، لە ساڵی (١٨١٨)ی زایینیدا پەیوەندی لەگەڵ (مەحمود پاشا)ی بابان تێك چوو، ئەمەش لەبەر ئەوەی داوای لە (مەحمود پاشا) دەکرد پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێراندا بپچڕێنێت بەڵام پاشای ناوبراو نەیتوانی ئەم کارە بکات، لە ئاکامدا (داود پاشا) (عینایەتوڵڵای مۆرداری)[١٦٦] نارد بۆ داگیرکردنی کۆیەو ناوبراو لە هەولێر سەربازگەی دانا[١٦٧]، ئەوەی زیاتر بارودۆخەکەی ئاڵۆزتر کرد ئەوەبوو کە حاکمی کۆیەی سەر بە (مەحمود پاشا) خیانەتی کردوو چووە پاڵ (عینایەتوڵڵا) کە لە ئەنجامدا کۆیە داگیرکرا، هەر بۆیە (مەحمود پاشا) داوای یارمەتی لە حاکمی کرماشان (محەمەد عەلی میرزا) کرد، ئێرانییەکانیش نزیکەی (١٠) هەزار چەکداریان بۆ یارمەتیدانی (مەحمود پاشا)ی بابان نارد. (داود پاشا)ی والی بەغداش هێزێك بۆ شاری کەرکوك بەمەبەستی ڕووبەڕووبوونەوەی ئێرانییەکان ڕەوانەکرد[١٦٨]. جێگەی باسە لەم کاتەدا هێزی (مەحمود پاشا)ی بابان لە هێزی کوردی‌و عەشایرەکان‌و ئێرانییەکان پێکهاتبوون‌و لە نزیك کەرکوك سەربازگەیان دانا[١٦٩].

ئەم بارگرژییەی ناوچەکە بووە هۆی دروست بوونی مەترسی ئێرانییەکان لەسەر شاری کەرکوك، ئەوەتا کاتێك (عەبدوڵڵا پاشا)ی بابان گەیشتە کەرکوك کە لەلایەن (داود پاشا)وە نێردرا بۆ سەرکردایەتی هێزەکان بینی کە تەواوی دۆڵەکانی ڕۆژهەڵاتی کەرکوك لە ژێر دەستی ئێرانییەکان بوون کە بۆ یارمەتی دانی (مەحمود پاشا)ی بابان هاتبوون[١٧٠]. لە لایەکی تر هەردوولا کە لە نزیك کەرکوك سەربازگەیان دژ بە یەکتر دانابوو چەند ڕۆژێك هەر بەم شێوەیە بەرانبەر یەکتر وەستان، ئێرانییەکان دەیانویست دەست بەسەر شاری کەرکوکدا بگرن‌و ئەو هێزەی کە لە شارەکەدایە لەناوی بەرن، هەرچەندە هەردوولا لەلایەن خۆیانەوە هەندێ جوڵانەوەی بچوکیان دژ بە یەکتر ئەنجامدا، بەڵام هیچ جۆرە جوڵانەوەیەکی گەورە لە هیچ لایەنێکەوە ڕووی نەدا، تاوەکو لە کۆتاییدا هەواڵی ئەوە بڵاوبووەوە کە (داود پاشا) بە هێزێکی گەورەوە ڕووی کردووەتە کەرکوك بۆیە ورەی هێزی (مەحمود پاشا) هاتە خوارێ‌و گەڕایەوە سلێمانی[١٧١]. دوای کشانەوەی هێزی (مەحمود پاشا)ی بابان‌و ئارام بوونەوەی بارودۆخەکە، ڕێکەوتنێك لەنێوانیاندا مۆرکرا کە بڕیادرا بە کشانەوەی هێزی ئێران‌و دەست تێوەرنەدانی ئێرانییەکان لە کاروباری کوردستان‌و گەڕانەوەی ئەو کەسانەی پەنایان بردووەتە بەر دەوڵەتی ئێران‌و وەرنەگرتنی خەڵکی هەڵاتوو بە پێچەوانەشەوە عوسمانییەکان هەڵاتووی ئێرانییەکان وەرنەگرن‌و هەڵاتووەکانیشیان بگەڕێنەوە[١٧٢].

ئەوەی جێگەی سەرەنجە لە ساڵی (١٨٢١)ی زایینیدا دووبارە ئاژاوە سەری هەڵدایەوە لەنێوان هەردوولادا ئەمەش بە هۆی ئەوەی ئەم ڕێکەوتننامەیە کاری پێنەکرا چونکە ژمارەیەك لە میرە کوردییەکان ڕایان کردە ئێران‌و چوونە پاڵ

شازادە (محەمەد عەلی میرزا)، لەوانە (محەمەد پاشای کوڕی خالید پاشای بابان)و (سلێمان پاشای کوڕی ئیبراهیم پاشا) و (عەبدوڵڵا پاشای مامی مەحمود پاشای بابان)و (شازادە محەمەد عەلی میرزا)ش دەستی کرد بە یارمەتیدان و پاڵپشتی کردنیان[١٧٣].

لەم بارودۆخەدا کە (مەحمود پاشا)ی بابان لایەنگری (داود پاشا) بوو چونکە شازادە دەیویست (عەبدوڵڵا پاشا) بکات بە میری بابان، هەر بۆیە دوای شەڕێکی توند لەنێوان هێزی (محەمەد کەتخودا)ی والی بەغداو هێزی (مەحمود پاشا) لەگەڵ هێزی (عەبدوڵڵا پاشا) بە یارمەتی شازادە لە قەرەگۆڵ[١٧٤] هێزی کە تخوداو (مەحمود پاشا) دوای تێکشکان گەڕانەوە کەرکوك[١٧٥]. بەڵام (محەمەد کەتخودا) والی بەغدا خیانەتی کردوو چووە پاڵ لایەنی ئێرانی[١٧٦] ئەم کارە بووە هۆی زیاتر باڵا دەست بوونی هێزی ئێرانی لە کوردستان کە بە سەرکردایەتی (محەمەد عەلی میرزا) بوو[١٧٧]، ئەم سەرکەوتنە بووە هۆی پێشرەوی هێزی ئێرانییەکان رووەو کەرکوك لە ساڵی (١٨٢١)ی زایینیدا کە (محەمەد کەتخودا) چاوساغیان بوو بەرەو شارەکە، پاش گەیشتنیان بە دووری سێ سەعات لە شارەکەدا سەربازگەیان داناو پەیوەندییان بە خەڵکی شاری کەرکوکەوە کردوو داوای خۆبەدەستەوە دانیان لێ کردن کە لە بەرانبەردا شازادە خوێنیان بپارێزێ. سەرەرای نیشاندانی هەردوو شێوازی نەرمی و هەرەشە ئامێز لەلایەن شازادەوە، بەڵام خەڵکی شارەکە خۆیان بە دەستەوە نەداو زیاتر سوور بوون لەسەر بەرگری کردن و بریاریان دا یەك دەست بن بەرانبەر دوژمن[١٧٨] هەر بۆیە لە ئاکامی ئەم بەرگری و خۆبەدەستەوەنەدانی خەڵکی کەرکوك و دێهاتەکانی کەرکوك لەلایەن سوپای ئێرانییەکان تاڵان و وێران کران و کوشتاری زۆریشی تێداکرا[١٧٩].

(لۆنگریك) لەم بارەیەوە دەڵێت: "جوتیارە تورکمانەکان دژی ملکەچی بوون بۆ هێزی ئێرانی بۆیە هەندێکیان لە سێدارەدران بە هۆی ئامادەنەبوونیان بۆ ملکەچی، خەڵکی قەڵاش خۆیان بەدەستەوە نەدا"[١٨٠]، سەرەرای ئەمانەش خەڵکی کەرکوك بەرگرییەکی دلێرانەیان لە شارەکەیان کرد[١٨١]، بێگومان ئەمەش مانای بەرگری خەڵکی شارەکە دەگەیەنێت دژی هێزی داگیرکاری ئێرانی. هەر بۆیە کاتێك شازادە بینی خەڵکەکەی سوورن لەسەر بەرگری کردن و خۆبەدەستەوە نەدان و ناتوانێت بە ئاسانی بەسەریاندا زاڵ بێت، مەبەستی سەرەکی ئەو داگیرکردنی بەغدا بوو، بۆیە هیچ سوودێکی لەوەدا نەبینی لە دژایەتی کردنی کەرکوکییەکاندا هێزەکانی زیانیان پێ بگات، بۆیە کەرکوك بە شێوەی گەمارۆدراوی بەجێ هێشت و رووی کردە بەغدا بۆ داگیرکردنی[١٨٢].

دوای کشانەوەی ئێرانییەکان و مردنی شازادە (محەمەد عەلی میرزا) بە هۆی بڵاوبونەوەی پەتای کۆلێرا لە ناو سوپاکەیدا[١٨٣]. (مەحمود پاشا)ی بابان ئەمەی بە هەل زانی بە یارمەتی والی بەغدا هێرشی کردە سەر (عەبدوڵڵا پاشا)ی مامی کە فەرمانڕەوای بابان بوو لە سلێمانی بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، بەڵکو (عەبدوڵڵا پاشا) تاوەکو قەرەحەسەنی نزیك کەرکوك بەدوای کەوت. بەڵام پاش دووبارە دەستپێکردنەوەی شەڕ لەنێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی (١٨٢٢)ی زایینیدا (مەحمود پاشا) دەستی بەسەر سلێمانیدا گرتەوە[١٨٤].

ئەوەی تێبینی دەکرێ لەم سەروبەندانەدا تاوەکو لەناوچوونی میرنشینی بابان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە، هێنانی ناوی کەرکوك لە رەوتی رووداوە سیاسییەکاندا کەم دەبێتەوە، بۆیە دەکرێ وا دابنێین کە ناوچەی کەرکوك لەم ماوەیەدا سەقامگیری بەخۆیەوە بینیوەو رووداوی ئەوتۆ رووی نەداوە کە شایەنی باس کردن بێت، هەروەها دیارە لە کۆتاییەکانی سەردەمی فەرمانڕەواییان رووداوەکانی میرنشینی بابان کاریگەرییان وەکو پێشتر بەسەر کەرکوکەوە نەبووە، بەڵکو ململانێکان زیاتر لە شاری سلێمانی یەکلادەکرانەوە.

لە راستیدا لەناوچوونی دەسەڵاتی مەمالیك لە بەغدا لە ساڵی (١٨٣١)ی زایینیدا لەم رووەوە کاریگەری خۆی هەبوو، هەر بۆیە لەم ماوانەدا بابانییەکان هیچ جۆرە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لەسەر کەرکوك نەبوو، تەنها ئەوە نەبێ کە لە ساڵی (١٨٤٠)ی زایینی دوای گەڕانەوەی (مەحمود پاشا)ی بابان لەلایەن (عەلی رەزا پاشا)ی والی بەغدا (١٨٣١-١٨٤١)ی زایینی بۆ بەغدا، لەم کاتەدا (ئەحمەد پاشای کوڕی سلێمان پاشا)ی بابان فەرمانڕەوایەتی بابانی بەدەستەوە بوو، بۆیە (عەلی بەگی کوڕی مەحمود پاشا) بە سوپای باوکییەوەو بە یارمەتی هێزی ئێران هەڵی کوتایە سەر سلێمانی بەڵام پاش تێك شکاندنی کشایەوە قەرەحەسەن لە نزیك کەرکوك[١٨٥].

رووداوێکی تری گرنگی ئەم ناوچەیە بریتی بوو لە فراوانخوازییەکانی (میر محەمەد)ی میری سۆران و هەوڵ دانی بۆ گرتنی شاری کەرکوك. ئەم میرە دوای ئەوەی لە کۆمەڵێ شەڕو فراوانخوازیدا سەرکەوتوو بوو توانی لە ساڵی (١٨٢٣) ی زایینیدا دەست بەسەر هەولێردا بگرێت، دواتر توانی پەیوەندی لەگەڵ پیاوماقوڵانی پردێ دا بکات و لەگەڵیاندا رێك بکەوێت، هەر بۆیە لە ئاداری (١٨٢٤) توانی شارەکە بگرێتە دەستی خۆی و رێکەوت لەگەڵ والی کەرکوك بۆ گرتنی زەوییەکانی میرنشینی بابان[١٨٦]. لە راستیدا لاوازی میرنشینی بابان یەکێك بوو لە هۆکارە یارمەتیدەرەکانی (میر محەمەد) بۆ داگیرکردنی زەوییەکانی میرنشینی ناوبراو[١٨٧]. ئەمە بێجگە لەوەی میری ناوبراو توانی شارەکانی کۆیە و رانیە لە ژێر دەستی بابانەکان دەربکات[١٨٨]. بەڵام دواتر دەسەڵاتی (میر محەمەد)ی رەواندوزی لەلایەن عوسمانییەکانەوە کۆتای پێ هات و توانیان لە ساڵی (١٨٣٦)ی زایینی لە ناوی بەرن[١٨٩]. بەم شێوەیە دەسەڵاتی (میر محەمەد)ی رەواندزی لە ناوچەکە کۆتای پێ هات کە ئەگەری ئەوەی لێ دەکرا دەست بەسەر شاری کەرکوکیشدا بگرێت[١٩٠].

**٤. هۆزی هەمەوەندو دەسەڵاتی عوسمانی:**

هۆزی هەمەوەند یەکێکە لە هۆزە کوردییە ناسراوەکان کە زۆربەی کات پەیوەندییان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا خۆش نەبوو، چونکە ئەم هۆزە چەندین جار راپەرین‌و شۆڕشیان دژی دەوڵەت بەرپاکردووە، ئەمەش بەشێکی پەیوەندی بە کەرکوك‌و ناوچەکانی هەبووە، کاریگەری بەسەر شارەکەوە بەجێ دەهێشت. بۆیە لێرەدا پێویستە باس بکرێت.

هۆزی هەمەوەند کە بە بۆچوونی هەندێ سەرچاوەو مێژوونووسان لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەمدا لە رۆژهەلاتی کوردستانەوە هاتوون‌و لە ناوچەی (بازیان) ی باکوری رۆژهەلاتی کەرکوك هەوارگەیان هەلدا[١٩١]، لە چەند تیرەیەك پێکهاتبوون لەوانە: (بەگزادە، رەشوەند، سەفەروەند، سیتەبەسەر، کافرۆش، پیریادی، سۆفیەوەند، چنگنی)[١٩٢].

بە پێی ساڵنامەی موسڵی (١٣١٢ کۆچی/١٨٩٣-١٨٩٤) ی زایینی هەمەوەندەکان لە قەزای بازیان‌و سەنجەقی شارەزوور نزیکەی (١٥٠) ماڵ دەبوون کە لە چەندین گوندی ناوچەکە بلاوبونەوە[١٩٣].

شایەنی باسە هەمەوەندەکان بە ئازاترین‌و زیرەکترین هۆزی کورد دادەنێن‌و دەڵێن چاونەترس‌و سوارچاکی بەهێزیان هەیە[١٩٤]، لەگەڵ ئەمەشدا هەمەوەندەکان هۆزێکی دیندارو خواپەرست بوونەو هەردەم دەست گیربوونە بە داب‌و نەریتی ئاینی[١٩٥]. ئەمە بێجگە لەوەی مێژووی ئەم هۆزە بەوە ناسراوە، کە هۆزی ناوبراو لە زۆربەی کاتدا لە بەرەنگاری‌و راپەرین بوونە دژ بە دەسەڵاتداران هەر بۆیە تووشی راوەدوونان‌و دوورخستنەوەش بوونەتەوە[١٩٦]، کە دواتر تیشکیان دەخەینە سەر. هەروەها ئەم هۆزە یەکێك بوونە لەو هۆزە کوردانەی لە شەرەکانی رووسیاو دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵانی (١٨٧٧-١٨٧٨)ی زایینی بەشداریان کردووەو رۆڵیان هەبوو لە پارمەتیدانی دەوڵەتی عوسمانیدا[١٩٧].

پەیوەندی عەشیرەتی هەمەوەند لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا لە زۆربەی کاتەکاندا خۆش نەبووە، بە تایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا کە بە لەناوبردنی میرنشینی بابان بۆشاییەکی سیاسی‌و سەربازی لە ناوچەکەدا پەیدابوو.

بەر لەوەی بێینە سەر باس کردنی بزاڤو جولانەوەکانی هۆزی هەمەوەند دژ بە حکومەتی عوسمانی، دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە حکومەتی ناوبراو ئەم جۆرە کارانەی بە کرداری هەلگەرانەوەو ئاژاوەگێری‌و رێگری ناودەبرد، بۆیە دەبێت ئەوە بزانین کە هەندێ جار جولانەوەو بزاڤی هۆزەکان دژی دەسەڵاتدارانی عوسمانی چەندین هۆکاری لە پشتەوە بووە، رەنگدانەوەی سیاسەتی خراپی دەوڵەتی عوسمانی بوو بەرانبەر هۆزە کوردییەکان.

لە بابەتەکانی پێشتردا تیشکێکمان خستە سەر هۆکارەکانی جولانەوەو بزاڤی هۆزە کوردییەکان دژ بە دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە دەڤەری کەرکوکدا، هەروەها ئەوەمان روونکردەوە یەکێك لە هۆکارەکانی جولانەوەی هۆزە کوردییەکان دەگەرایەوە بۆ زۆری رێژەی ئەو باج‌و پیتاکانەی کە لەلایەن دەسەڵاتدارانی عوسمانییەوە بەسەریاندا سەپێنرابوو. لە لایەکی تر لاوازی دەسەڵاتی دەوڵەت لە هەندێ ناوچەدا بە تایبەتی ناوچە شاخاوییەکان رۆڵی گرنگی هەبوو لە بەهێز بوونی دەسەڵاتی هۆزەکان‌و دروست بوونی ئاژاوەو رێگری لەسەر دەستی ئەم هۆزانە[١٩٨].

هۆیەکی تری جولانەوەو هەلگەرانەوەکان هۆزە کوردییەکان بریتی بوو لە هەوڵەکانی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی‌و ئێرانی بۆ سوود وەرگرتن لەم هۆزانەو بەکارهێنانیان بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان لە دژی بەرژەوندی بەرانبەریان، ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی هەولبدەن لە رێگەی هێزەوە سەرکوتیان بکەن[١٩٩].

لێرەدا ئەگەر باسی شەری نێوان هەمەوەندو دەسەڵاتدارانی عوسمانی بکەین دەبینین چەندین جار شەرو لێکدان لەنێوان ئەم هۆزەو دەوڵەت دا دروست بووە، بەلام هەوڵ دەدەین تەنها ئەو شەرانە بخەینە روو کە پەیوەندییان بە ناوچەی کەرکوکەوە هەبوو.

هەمەوەندەکان لە سەردەمی والی بەغدا (سەردار ئەکرەم پاشا) لە ساڵی (١٨٥٩)ی زایینی دەستیان کرد بە گرتنی رێگەی نێوان کەرکوك‌و سلێمانی، ئەمە بێجگە لەوەی هەندێ لە جوتیارەکانیان ئازارداو تالانیان کردن، هەر بۆیە والی ناوبراو هێرشی کردە سەریان‌و هەندێ لە سەرکردەکانیانی لە سێدارەدا. بەلام بابی عالی لە ئەستەمبوڵ لەم کارەی والی بەغدا تورە بوو چونکە والی ناوبراو بەبێ پرسی ئەستەمبوڵ هێرشی کردبووە سەر هۆزی هەمەوەند، ئەمەش لەبەر ئەوەی کاربەدەستانی ئەستانە پێیان وابوو کە هۆزی ناوبراو یەکێکن لەو هۆزانەی لەنێوان عێراق‌و ئێراندا هاتووچۆ دەکەن‌و نیشتەجێ نین لەبەر ئەوە فشار خستنە سەریان دەبێتە هۆی ئەوەی پەنابەرنە بەر ئێران، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئێرانییەکان بە لای خۆیان دا رایان بکێشن، هەر بۆیە کاربەدەستانی ئەستانە لە (٢٥)ی ئەیلولی ساڵی (١٨٥٩) والی بەغدایان لابرد[٢٠٠].

لە سەردەمی (مەدحەت پاشا)دا (١٨٦٩-١٨٧٢)ی زایینی، شەر لەنێوان هەمەوەندەکان‌و دەوڵەتدا سەری هەلدا لە ئاکامدا هەمەوەندەکان هێرشیان کردە سەر دێهاتەکانی کەرکوك‌و وێرانیان کرد[٢٠١]. و لە هەموو کەرکوکدا تالانی کاروانییەکان دەست پێکرد[٢٠٢]. هەر بۆیە (مەدحەت پاشا) هێزێکی ناردە سەریان کە لەناو ئەم هێزەدا (٥٠٠) سوارەی چەرکەسیش هەبوون، بەلام هەمەوەندەکان ئەم هێزەیان لە (دوانزە ئیمام) لە نزیك کفری تێکشکاند، کەمێك دوای ئەم رووداوە هێزێکی تری دەوڵەتیان لە نزیك خانەقین تێك شکاند[٢٠٣]. هەر بۆیە (مەدحەت پاشا) لە سەردەمی فەرمانرەوای خۆیدا هەولی دا بەسەر هەمەوەندەکاندا زاڵ بێت، بەلام نەیتوانی ئەم کارە ئەنجام بدات چونکە هۆزی ناوبراو پاش هەر جولانەوەیەکیان رایان دەکردە ئێران بۆیە ئاوا بە ئاسانی کۆنترۆڵ نەدەکران[٢٠٤].

هەمەوەندەکان لە ساڵی (١٨٧٤)ی زایینیدا جارێکی تر جولانەوەیان لەسەر سنوور دەستپێکردەوە، لە ئاکامدا دەستیان کرد بە هێرش بۆ سەر مەندەلی لەسەر سنووری

ئێران، بەڵام کاتێك دەوڵەتی عوسمانی بە سوپاو یارمەتی هۆزەکان بۆیان دەرچوون رایان کردەووە ناو وڵاتی ئێران[٢٠٥]. شایەنی ئاماژەیە هەمەوەندەکان هەندێ جار دەبوونە مایەی بارگرژی لەنێوان دەوڵەتی عوسمانیو قاجاریدا چونکە کاتێ لەناو خاکی هەریەکێ لەم دوو دەوڵەتە ئاژاوەیەکیان دەنایەوە رایان دەکردە ناو خاکی دەوڵەتەکەی تر، بۆیە دەبینین هەمەوەندەکان لە بەغداوە تاوەکو کەرکوك و کرماشان ئارامیان لە دەوڵەتی عوسمانیو قاجارییەکان هەڵگرتبوو ئەمەش نیگەرانی بۆ هەردوو دەوڵەت دروست کردبوو[٢٠٦]. ئەوەتا لۆنگریك لەم بارەیەوە دەڵێت: "لە کەرکوك تا هەمەدان ناوچەی هێرشو تالانکاری هەمەوەند بوو"[٢٠٧]، ئەمە بێجگە لەوەی هەمەوەندەکان چەندین جار لە ناوچەکانی نێوان کەرکوكو سلێمانی چالاکیو رێگریان ئەنجام دەدا[٢٠٨] ئەوەی جێگەی باسە هەندێ جار چالاکییەکانی هۆزی هەمەوەند بە جۆرێك پەرەی سەندوە تەنانەت گەیشتۆتە دەوروبەری سامەرا، هەر بۆیە قایمقامی سامەرا بەرپەرچی داونەتەوە[٢٠٩].

لە لایەکی ترەوە هۆزی ناوبراو لە درێژەی شاڵاوەکانیاندا لە ساڵی (١٨٧٩)ی زایینیدا لە نزیك کەرکوك دەستیان کرد بە هێرش بۆ سەر کاروانە بازرگانییەکان لەنێوان بەغداو موسڵ. هەر بۆیە پاشای بەغدا شاڵاوێکی بەهێزی کردە سەریان کە لە چەندین تیپی سوارەو پیادەو تۆپ پێکهاتبوو لە ئاکامدا شەڕێکی توند لە نزیك دەشتی کەرکوك لەنێوانیاندا روویدا لە ئاکامدا هەمەوەندەکان بەسەریاندا زاڵ بوون، هەر بۆیە پاشای بەغدا دوای چەند مانگێك سیاسەتی بەخشینی پارەی بۆ هۆزە کوردییەکان پێڕەو کرد بۆ دابین کردنی ئاسایش بۆ تەواوی کاروانەکانیان[٢١٠].

هەروەها لە درێژەی جموجۆڵەکانی هەمەوەند دژی دەسەڵاتدارێتی عوسمانی توانیان لە بەرواری (٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٨٧٩)ی زایینیدا دەست بەسەر قەرەداغدا بگرنو قایمقامی شارەکەیان کوشتو شارەکەیان تالانکرد، لە راستیدا ئەم کارەی هەمەوەندەکان لە قەرەداغ کاردانەوەی لەسەر کەرکوك هەبوو چونکە والی شارەکە شەش سەرۆك هۆزی سەرەکی بانگهێشت کرد بۆ کەرکوك، تاوەکو لە رێگەی ئەوانەوە بتوانن چارەسەری بارودۆخەکە بکەن، بەڵام دوای ئەوەی لەگەڵ حکومەت دەکەونە وتووێژو پاش ئەوەی دەبیستن کاروان گەلێك گیراونو رووت کراونەتەوە، دەمو دەست ئەم شەش سەرۆك هۆزە کوردە رادەکەن ئەمەش لە ترسی ئەوەی نەوەکو وەکو شەریکە بەش لەگەڵ دزەکاندا دەستگیریان بکەن، هەر بۆیە رێگەی نێوان کەرکوكو سلێمانی ئاسایشی تێدا نەمابوو، بە شێوەیەك کاربەدەستانی عوسمانی هاتووچۆی نێوان ئەم دوو شارەیان قەدەغەکردو داوایان لە کاروانەکان کرد گەشت نەکەنو تەلەگراف بۆ بازرگانە بە کۆمەڵ فرۆشەکان کرابوو کە کەلوپەلەکانیان نەنێرن چونکە لە رێگەو بانەکان دڵنیا نین[٢١١].

جێگەی باسە ئەم هۆزە لە درێژەی جوڵانەوەکانیان دژی حکومەت لە ساڵی (١٨٨٠)ی زایینیدا دەستیان کردەوە بە جوڵانەوەکانیانو توانیان دەست بەسەر رۆژهەڵاتی کەرکوکدا بگرن[٢١٢]. هەروەها گەشتیارێکی هۆڵەندی کە خۆی لە چارەکی کۆتای سەدەی نۆزدەدا هاتووەتە کەرکوك باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە دوو شەڕ لە بەرزاییەکانی چیای حەمرین لە رۆژئاوای کەرکوك لەنێوان لەشکری تورکی عوسمانیو هەمەوەندەکان روویداوە لە ساڵانی (١٨٨٦-١٨٨٧)ی زایینیو ساڵی (١٨٩٠-١٨٩١)ی زایینیدا، بە جۆرێك گەریدەی هۆڵەندی دەگێڕێتەوە کە (حوسێن ئاغا)ی هەمەوەند، یەکێك بووە لە سەرکردەکانی هەمەوەند، ئەوەی بۆ باس کردم کە لە ساڵی (١٨٩٠)ی زایینیدا خۆیو هۆزەکەی توانیویانە بەسەر (١٠٠٠) سەربازی تورکدا زاڵبنو لە ئاکامدا (١٢٠) هەزار لیرەی تورکی لەو جەنگەدا دەستکەوتووە. جێگەی ئاماژەیە گەریدەی هۆڵەندی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە هۆکاری ئەم جەنگانە لەبەر چەتەییو رێگری هەمەوەندەکان بووە لە چیای حەمرین، هەر بۆیە رێگەی حەمرین رێگەیەکی ئەمین نیە ئەمەش لەبەر بوونی چەتەو رێگران. هەروەها ناوبراو ئاماژە بەوە دەکات کە هەمەوەندەکان زۆر جار رێگەی هاموشۆی نێوان بەغداو موسڵیان گرتووە[٢١٣]. گەریدەی هۆڵەندی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەرچەندە لە باشوورو ناوەراستی بەرزاییەکانی حەمرین دا دەوڵەتی عوسمانی چەند پۆستێکی جەندرمەی تورکی داناوە بۆ پاراستنی رێبوارو کاروانەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەمرین جێگەیەکی ئەمین نیەو کاروانچی شادومان دەبێت دەستی ئۆخەی دەخاتە سەر دڵی ئەگەر هاتو بە سەلامەتی بە حەمریندا تێپەڕیو رووت نەکرێتەوە[٢١٤].

لە درێژەی چالاکی هەمەوەندەکان دژ بە دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە ناوچەکەدا لە ساڵی (١٩٠٠)ی زایینیدا هەمەوەندەکان بە هاندانی شێخەکانی سلێمانیو قەرەداغ دەستیان کرد بە شاڵاوێك بۆ سەر حاجیە ئێرانییەکان لە نزیك کەرکوك کە لە ئاکامدا ژمارەیەك حاجیان کوشت، هەر بۆیە حاجیە ئێرانییەکان کە پێشتر بە رەواندزو سلێمانیو کۆیەدا تێپەڕدەبوون، بەڵام رێگەکەی خۆیان گۆڕی لە ساڵانی داهاتوودا لە کوردستانی رۆژهەڵاتەوە یەکسەر دەچوونە بەغداو لەوێوە دەچوون بۆ حەج[٢١٥]. بێگومان لە ئەنجامی گۆڕینی ئەم رێڕەوەی حەج کە لە ئاکامی جوڵانەوەی هەمەوەندەکان بوو، پێدەچێت زیانی ئابووری بە خەڵکی ناوچەکە گەیاندبێ چونکە تێپەڕبوونی حاجییەکان بەم ناوچانەدا مایەی قازانج بووە بۆ دانیشتووانی ئەو ناوچانەی کە ئەو حاجیانە پێیدا تێپەڕدەبوون.

لە راستیدا هەر ئەو بارودۆخە وای لە دەوڵەت کرد چەندین هێرش بکاتە سەر ئەو هۆزەی هەمەوەند هەروەکو لە پێشتر ئاماژەمان بۆی کرد، چونکە هۆزی ناوبراو بە گوێرەی بەڵگەنامەکانی عوسمانی بوو بوونە مایەی ترسو دڵەراوکێ بۆ دانیشتووان، بە تایبەتی گوندنشینەکانی دەوروبەری کەرکوك[٢١٦]، ئەوەتا لەم بارەیەوە بەڵگە نامەیەکی عوسمانی ئاماژە بەوە دەکات کە نزیکەی (٦٠٠) گوند لە ناوچەی سلێمانیو هەندێ گوند لە دەڤەری کەرکوك لەسەر دەستی ئەم هۆزە تووشی لەناوچوونو کاولکاری بونەتەوە[٢١٧].

لەم باسەی رابردوودا بۆمان روون دەبێتەوە کە لە

نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا بە هۆی نەمانی میرنشینە کوردییەکان‌و ئەو بۆشاییی کە لە ناوچە کوردییەکاندا دروست بوو، هۆزە کوردییەکان بەشێك لە پڕکردنەوەی بۆشایی ناوچەکەیان بەرکەوتووە هەر بۆیە هەوڵیان داوە رووبەرووی دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە ناوچەکەدا ببنەوە. ئەمە بێجگە لەوەی هەندێ لە جوڵانەوەکانی هەمەوەند لە ناوچەکەدا دەچێتە خانەی ناکۆکی نێوان هۆزە کوردییەکان، کە هەندێ جاریش دەسەڵاتدارانی عوسمانی دەستیان هەبوو لەو ناکۆکیانەوە هەوڵیانداوە سوود لە هۆزە کوردییەکانی تر وەربگرن بۆ لێدانی هەمەوەندەکان کە لە داهاتوودا روونی دەکەینەوە.

### ٥. کێشەی نێوان هۆزەکان:

لە باسی رابردوودا ئاماژە بە کێشەی نێوان هۆزی هەمەوەندو دەسەڵاتدارای عوسمانیمان کرد، بەڵام لەم بابەتەدا هەوڵ دەدەین کێشەی نێوان ئەو هۆزە کوردیانە شی بکەینەوە کە لە ناوچەی کەرکوك نیشتەجێ بوون.

یەکێك لەو کێشە گرنگانەی کە دەوڵەتی عوسمانی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە رووبەرووی بوو بوەوە زۆربوونی کێشەی هۆزەکان بوو، ئەمەش زیاتر لە هۆکارێك کاریگەری بەسەریانەوە هەبوو وەك دواکەوتویی دەوڵەتی عوسمانی‌و باڵکێشانی نەخوێندەواری‌و دابونەریتی خێڵەکی‌و هۆزایەتی بەسەر کۆمەڵگەداو بڵاوبوونەوەی گەندەڵی لە دام‌و دەزگاکانی دەوڵەتدا[٢١٨].

یەکێك لەو کێشانە بریتی بوو لە کێشەی نێوان هۆزی هەمەوەندو هۆزی زەنگەنە، هۆی دروست بوونی ئەم کێشەیەش بە هۆی ئەوەوە بوو کە سەرۆکێکی هەمەوەندەکان لەلایەن هۆزی زەنگەنە لە ساڵی (١٨٧٨)ی زایینیدا کوژرا، هەر بۆیە لە ئاکامی ئەو شەڕەی کە لەنێوانیاندا سەری هەڵدا زەنگەنەکان شکان بە جۆرێك هەمەوەندەکان تا (شێخ لەنگەر) راویان نان[٢١٩].

ئەوەی لێرەدا جێگەی سەرەنجە پاش ئەم تێکشکانە کاتێك هۆزی زەنگەنە داوای یارمەتی لە دەوڵەتی عوسمانی دەکەن، دەوڵەت راستەوخۆ کەوتە یارمەتی دانی هۆزی ناوبراو دژ بە هۆزی هەمەوەند[٢٢٠]، دیارە وەك دواتر بە دیار دەکەوێ ئەمەش بۆ ئەوە بوو تاوەکو دەوڵەت بتوانێت بەسەر هەمەوەندەکاندا زاڵ ببێت‌و جڵەوگیریان بکات، ئەمە جگە لە سیاسەتی سوود وەرگرتن لە هۆزە کوردییەکانی تر بۆ لێدانی هەمەوەندەکان.

دوای ئەوەی هۆزی زەنگەنە لەلایەن حکومەتەوە یارمەتی بۆ هات کە خۆی لە (٦٠) سوارەو (٤٠) ئێسترو (٢) تۆپی جیا دەبینییەوە، ئەم لەشکرە چووە (شێخ لەنگەر)، هەروەها قایمقامی (سەڵاحیە – کفری) بە (٧٥٠) سوارەو (٨٠) ژەندرمەو هۆزەکانی (زەندو پاڵانی)و هەندێ سوارەی تاڵەبانی‌و باجەلان لەگەڵ لەشکری پێشووتردا یەکیان گرت، بەڵام هەمەوەندەکان سڵیان لەم هێزە زۆرە نەکردەوەو تێکیان شکاندن، هەروەها هەمەوەندەکان لە کاتی گەڕانەوەشیان کە دەچوون بۆ کەرکوك دوو تابوری تری پیادەیان تێك شکاند، دواتر توانیان (٨) تابوری تری پیادە لە گۆپ تەپە تێك بشکێن‌و پاشان بە ماڵ‌و منداڵەوە چوونە زەهاو لە ئێران[٢٢١].

هەروەها لە کاتی هێرشەکانیان بۆ سەر هەرێمەکانی سلێمانی و کەرکوك هەمەوەندەکان رووبەرووی بەرگری هۆزی جاف بوونەوە[٢٢٢] پێدەچێت ئەم هۆزەش لەلایەن حکومەتی عوسمانییەوە هاندرابێ، چونکە کاتێك لە ساڵی (١٨٨٠)ی زایینیدا نێوان جاف‌و هەمەوەندەکان تێك چووو جافەکان لە بەرانبەر هەمەوەندەکاندا تێك شکان، (تەقی پاشا)ی والی بەغدا (١٨٨٠-١٨٨٧)ی زایینی لەشکرێکی نارد بۆ یارمەتی دانی هۆزی جاف[٢٢٣]. لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە دەوڵەتی عوسمانی هەوڵی داوە سوود لە ناکۆکی نێوان هۆزە کوردییەکان وەربگرێت بۆ مەرامی لاوازکردنی هۆزە کوردییەکان لە لایەك‌و هەوڵدان بۆ سوود وەرگرتن لە هۆزێك دژی هۆزێکی تر لە لایەکی ترەوە. بێگومان ئەمەش مانای بەکارهێنانی سیاسەتی (پەرتکەو زاڵبە) دەگەیەنێت کە زۆربەی کات دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە بەرانبەر هۆزەکانی ناوچەکە پێڕەویان کردووە.

یەکێکی تر لە شەڕەکانی نێوان هۆزە کوردییەکان شەڕی نێوان هۆزی هەمەوەندو شوان بوو لە ساڵی (١٨٩٨)ی زایینیدا. یەکێ لەو راپۆرتانەی سەر عەسکەری عوسمانی (رەزا پاشا) لە (٨)ی ئابی ساڵی (١٨٩٨)ی زایینیدا کە بۆ (سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم) (١٨٧٦-١٩٠٩)ی زایینیی رەوانە کردووە، باسی ئەوە دەکات هۆزی هەمەوەند بەوە ناسراون کە گوێڕایەڵ نین بۆ فەرمانەکانی حکومەت، هێرشی کردووەتە سەر هۆزی شوان‌و ئەوەی دووەمیان بە گوێڕایەڵی بۆ دەوڵەت ناسراون، لە ئاکامدا زیاتر لە (١٠) گوندی شوانەکانیان سووتاندووەو ماڵ‌و ئاژەڵەکانیان لێ تاڵان کردوون، ئەمە بێجگە لەوەی دانیشتووانی (٦) گوندی تری هۆزی شوانیان لە قەزای بازیان ناچارکردووە شوێن‌و جێگەی خۆیان بەجێ بهێڵن، ئەمەش لە ترسی دەستدرێژی هەمەوەندەکان کە رۆژ بە رۆژ لە زیادبوون دان. هەر لە هەمان راپۆرتدا داواکراوەکە بۆ لەناوبردنی مەترسییەکانی ئەم هۆزە پێویستە هێزی عوسمانی لە ویلایەتی موسڵ زیاد بکرێت، و هەر هۆزێك بە ژمارەیەك لە سوارە بەشداری بکات بۆ یارمەتیدانی ئەو هێزەی کە لە بەغداوە دێ کە لەنێوان (٤٠٠) تا (٥٠٠) پیاو پێکهاتووە بە سەرکردایەتی فەرمانرەوای هێزی تۆپی گەرۆك. لە هەمان راپۆرتدا داواکراوە رێگەکانی دەوروبەری کفری بپارێزرێ، ئەمەش لەبەر ئەوەی هەمەوەندەکان هەرەشەن بۆ سەر ئەم ناوچانە، و پێویستە دووبارە ئەو هێزەی کە لە ٣٠٠ کەس پێکهاتووە لە ئاکرێ‌و زێبار بنێردرێنەوە بۆ موسڵ‌و ئامادەکاری‌و رێوشوێنی پێویست بگیرێنە بەر بۆ ئامادەکردنی هێزی تری پێویست بۆ لێدان‌و لەناوبردنی سەرپێچی کاران[٢٢٤].

هەروەها لە راپۆرتێکی تری سەر عەسکەری ناوبراودا لە بەرواری (١٧)ی ئەیلولی ساڵی (١٨٩٨)ی زایینیدا هاتووە کە موتەسەریفی سلێمانی لەسەر ئیفاداتی هەمەوەندەکان هەواڵی ئەوەی داوە کە هۆزەکانی شوان‌و شێخ بزێنی دوو گوندی هەمەوەندەکانیان بە ناوی (پیریادی‌و مزاقە)

گەمارۆداوە، بەڵام پاش لێکۆڵینەوە دەرکەوتوە کە ئەو دوو گوندە نەك لەلایەن دوو هۆزی ناوبراو گەمارۆداوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەمەوەندەکان خۆیان (٢٠٠) سوارەیان کۆکردووەتەوە بۆ هێرش کردن بۆ سەر گوندەکانی ناحیەی شوانو هێرشیان کردووەتە سەر هەندێ لادێ لە نزیك کەرکوكو ئاگریان لێ بەرداونو دووکەڵ بەرزبووەتەوە. هەر بۆیە بۆ رێگرتن لەم کارانە وەکیلی سەرکردەی فیرقەی (١٢) و بەرپرسانی کارگێری کەرکوك پێیان راگەیاندوین، کە تاکە رێگە بۆ بەرگرتن لەم کارانە بریتیە لە تەمبێکردنی ئەوانە بە شێوەی خێرا لە رێگەی هێزی سەربازی[٢٢٥].

بەڵام لە پاشاندا هێرش بۆ سەر هۆزی هەمەوەند ئەنجام نەدرا بە هۆی رازی نەبوونی سوڵتانی عوسمانی لەسەر ئەو کارە بۆیە توانرا لە رێگەی دەستەی ئاشتکردنەوە (هیئة الصلح) لە کەرکوكو سلێمانی نێوان ئەم هۆزانە چاك بکرێتەوە. هەر بۆیە لە بەڵگەنامەیەکی دەوڵەتی عوسمانی لە بەرواری (٢٧)ی ئەیلولی ساڵی (١٨٩٨)ی زایینی هاتووە، کە گەورە پیاوانی هۆزەکان کۆبونەوە بۆ ئاشت بوونەوە لە سلێمانیو کەرکوك رێکەوتن لەسەر ئەوەی کە هەمەوەندەکان (١٠٠) پارچە چەكو چوار هێستر بگەرێتەوە بۆ شوانەکان لە ماوەی (٢١) رۆژدا، لە بەندەکانی ئاشتبونەوەکەدا هاتووە:

١. لە ئێستاوە هیچ مافێك بۆ هیچ یەك لە هەردوو لایەن نامێنێ، ئەمە دۆزو کێشە کۆنەکانیش دەگرێتەوە. نابێ هیچ جۆرە بەرزکردنەوە وەیان کاری دەمەقاڵێ دژ بە یەکتر بکەن.

٢. نابێ هیچ کەسێك لە هەردوو لایان کاری چەتەگەریو دزی ئاشکراو نهێنی بکات.

٣. هەردوو پەیمان دەدەن کاروانو رێبوارانی سەر بە هەردوو عەشیرەتو ئەوانەی سنوورەکان لەنێوانیان دەپەرنەوە بۆ ئەوەی کارەکانی خۆیان ئەنجام بدەن بپارێزنو رێگەیان لێ نەگرن.

٤. ئەوەی پێچەوانە ئەم مەرجانە بجوڵێتەوە دەبێ چاوەروانی توندترین سزا لەلایەن حکومەتەوە بکات. نەك تەنها ئەمە بەڵکو دەبێ خەرجی هەموو هێزەکانی سوپاو پۆلیسو دەستەکانیش بگرێتە ئەستۆی خۆی[٢٢٦].

وادیارە هەر چەندە هەمەوەندو شوان لەسەر دەستی دەستەی ئاشتکردنەوەی عوسمانی لە کەرکوك ئاشت بوونەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دوو هۆزە کوردییە هێشتا نیگەرانیان لە هەمبەر یەکتردا مابوو و سڵیان لە یەکتر دەکردەوەو لە هەندێ بارودۆخدا چاودێری یەکیان کردووە، ئەمەش لە گوزارشی ئەفسەرو گەریدەی بەریتانی (مێجەرسۆن) بەدیاردەکەوێت کە لە ساڵی (١٩٠٧)ی زایینیدا هاتووەتە ناو شوانو هەمەوەندەکان، واتا پاش تێپەربوونی نۆ ساڵ بەسەر شەری هەردوو هۆزی ناوبراودا[٢٢٧].

گەریدەی هۆڵەندی (بارۆن ئێدوارد نۆلد)ە کە لە چارەکی دوایی سەدەی نۆزدەدا هاتووەتە ناوچەی کەرکوك. ئاماژە بە بارگرژیو ناخۆشیو خوێنرشتن لەنێوان هەردوو هۆزی هەمەوەندو داوده دەکات، جێگەی ئاماژەیە کە ئەم هۆزەی دووەمیان یەکێکە لە هۆزەکانی دەورووبەری کەرکوك لە خورماتوو داقوق دەژین. بە پێی گوزارشی گەریدەی ناوبراو ناکۆکی نێوان ئەم دوو هۆزە ماوەیەکی زۆری خایاندوە[٢٢٨].

هەروەها لەبەر جوڵانەوەی هەمەوەند دژ بە دەسەڵاتدارێتی عوسمانیو لەبەر دروستبوونی کێشە لەنێوان هۆزی هەمەوەند چەند هۆزێکی تری کوردی. دەوڵەتی عوسمانی سیاسەتی راگوێزانو دوورخستەوەی دژ بە هۆزی هەمەوەند بەکارهێنا، ئەمەش خۆی دەبینێتەوە لە دوورخستنەوەی هەندێ کەس لە کەرکوکدا کە دەستیان لە کێشەی نێوان هۆزەکاندا هەبوو بۆ لیبیاو دیمەشقو ویلایەتی قۆنیا لە ئەنادۆڵ، هەروەها دەسەڵاتدارانی عوسمانی جێگۆرکێیان بە هەندێ لە کاربەدەستانی دەوڵەت کرد لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر[٢٢٩].

جێگەی ئاماژەیە دەوڵەتی عوسمانی چەندین شێوازی بەکارهێنا بۆ رێگرتن لە چالاکی هەمەوەندەکانو ئارامکردنەوەیان، هەروەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند رێگەیەکی تری بەکارهێنا بۆ هێورکردنەوەی هەمەوەندەکان لەوانە هەوڵ دان بۆ پەروەردەو فێرکردنی هەمەوەندەکانو هەوڵدان بۆ کردنەوەی قوتابخانە لە گوندەکانیانو دامەزراندنی ژمارەی زۆر لە ئەندامانی هۆزی هەمەوەند لە بواری سەربازیو نیشتەجێ کردنیان[٢٣٠].

یەکێکی تر لە کێشەی نێوان هۆزە کوردییەکان لە دەڤەری کەرکوك بریتی بوو لە کێشەی نێوان تاڵەبانیو بەرزنجییەکان، ئەوەتا بە پێی بەڵگە نامەیەکی عوسمانی کە بەرواری تشرینی یەکەمی (١٨٨٦)ی زایینیی هەڵگرتووە باس لە سەرهەڵدانی کێشە لەنێوان بەرزنجیو تاڵەبانییەکان دەکات لە دەورووبەری کەرکوك. هەر ئەم بەڵگەنامەیە ئاماژە بەوە دەکات کە هۆزی هەمەوەندو هەندێ هۆزی تر ئاژاوە دەگێرنو ستەم دەکەن، بۆیە داوا لە دەستەی ئاشتکردنەوەو کارگێری ناوخۆی ویلایەت کراوە کە هەوڵی چاك کردنەوەی پەیوەندی نێوانیان بدات. هەروەها لە پەراوێزی ئەم بەڵگەنامەیەی باسمان کرد هاتووە کە دەبێت لە کاتی پێکهێنانەوەیان ئەوە لەبەر چاو بگیرێ کە لەسەر بنەمای دادپەروەریو مافو پارێزگاری لێکردنیان هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکرێ[٢٣١].

لە یەکێك لەو راپۆرتانەی (ئیسماعیل حەقی) مەئموری چاکسازی لە کەرکوك کە لە ساڵی (١٨٨٧)ی زایینیدا بۆ بەرپرسانی ئەستانە بەرزی کردووەتەوە هاتووە کە هۆی دروست بوونی کێشە لەنێوان تاڵەبانیو بەرزنجەکان دەگەرێتەوە بۆ ئەو کوشتنەی کە لەنێوان بەرزنجیو تاڵەبانییەکاندا روویداوە ئەمەش هۆی ئەوە بووە کە (عەبدولسەمەد تاڵەبانی) لەسەر دەستی بەرزنجەکان کوژراوەو کاری تەقە لە یەکتر کردن لە دەورووبەری کەرکوك روویداوە، کە لە ئەنجامدا چەندین کەس بەم کارەوە تێوەگلاوە، هەر بۆیە دادگا بریاری خۆی دەردەکات بۆ کۆتایی هێنان بەم کێشەیە. لە ئەنجامدا سێ کەسیان حوکم داوە لە بەرزنجەکان بە بەندکردنیان بە هۆی تۆمەت بار کردنیان لە کێشەی کوشتنی (عەبدولسەمەد تاڵەبانی)، حوکم دانی دوو کەسی تر لە بەرزنجەکانو چوار کەس لە تاڵەبانییەکان بە هۆی

دەست هەبوونیان لە پێکدادان و تەقەکردن لە دەوروبەری کەرکوك، بۆیە نۆ کەس فەرمانیان بەسەردا سەپێنرا[٢٣٢].

جێگەی ئاماژە بۆ کردنە کە (شێخ رەزا)ی شاعیر لە هەندێ لە شیعرەکانیدا هێرشی کردووەتە سەر هۆزەکانی جەباری و داوەدە و کاکەیی کە پێدەچێت ئەم هۆزانەش کێشەیان لەگەڵ بنەماڵەی تاڵەبانیدا هەبووبێ[٢٣٣]، ئەوەتا (شێخ رەزا)ی شاعیر لە بارەی شەڕی نێوان تاڵەبانی و هۆزی داودە لە شیعرێکدا دەڵێت:

ازان سوچ و (داوودە) لەشکر کشید
ازین سوجنبید (عبدالحمید)
بفرمود تا(تالبانی) گروە
نستندبر خانە زین چوکوە

دەقی شیعرەکە بە زمانی کوردی:
کە (داودە) لەو لاوە لەشکریان هێنا
عبدولحەمید لەم لاوە بزووت
فەرمووی کە دەستەی (تاڵەبانی)
وەکو کێو لەسەر پشتی زین دانیشتن[٢٣٤]

لە لایەکی تر دەوڵەت لە سەردەمی (سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم)دا دەستی کرد بە پەرەپێدان و پاڵپشتی کردنی لایەنی مەزهەبی بە تایبەتی تەریقەتە سۆفیگەرییەکان وەکو پاڵپشتی کردنی بەرزنجەکان لە سلێمانی و کەرکوکدا[٢٣٥]، هەر بۆیە کاربەدەستانی عوسمانی هەوڵیان داوە لە کاتی بوونی ئاژاوەکاندا چاو لە بەرزنجەکان بپۆشن ئەمەش بە بیانوی ئەوەی ئەوان لە بنەماڵەیەکی پاکن[٢٣٦]. ئەوەتا لە یەکێك لە بەڵگەنامەکاندا هاتووە کە بە هۆی دواکەوتنی بریارێکی تایبەت بە سەرکردەکانی بەرزنجەکان بۆیە تاوانەکانیان بەردەوامن، ئەمەش بە هۆی دەرنەچوونی بریارێك دژی یەکێك لە پیاوە بکوژەکانی (سەید ئەحمەدی نەقشبەندی خانەقا)[٢٣٧]. لە راستیدا ئەمەش مانای نەبوونی دادپەروەری راستەقینە و تەواوە لەنێوان هاووڵاتیاندا، هەر بۆیە ئەم جۆرە رەفتارانە هەندێ جار بووەتە هۆی دروست بوونی ئاژاوە لەنێوان خەڵکدا.

دیارە بارگرژی و ئاژاوە لە هەردوو سەنجەقی کەرکوك و سلێمانی بەردەوام بووە لەم ماوەیەدا، ئەمەش لە بەڵگەنامەکانی دەوڵەتی عوسمانی کە لە بارەی ناوچەکەوە بەرزکرانەتەوە دەردەکەوێ، هۆی ئەم ئاژاوانەشیان گەڕاندووەتەوە بۆ سەرکردە ناوخۆییەکان کە خەڵکی بە ئاراستەی گومراییدا دەبەن و تاوانباران پەنا دەدەن و دەست درێژی دەکەنە سەر خەڵکی، جێگەی باسە ئەم راپۆرتانە بە زمانێکی زبر و توند ئەو سەرکردە ناوخۆیانە تاوانبار دەکەن بە کاری بێ ئابرویی و کوشتن و تاڵان و دەست درێژکردنە سەر خەڵکی، هەر بۆیە کاربەدەستانی عوسمانی لە ناوچەی کەرکوکدا پێشنیاری ئەوەیان کردووە کە مەڵبەندی ویلایەتی موسڵ بگوێزرێتەوە بۆ کەرکوك و هەوڵ بدرێ بۆ کۆکردنەوەی ئەو چەکانەی کە لە دەستی خەڵکدان لە هەردوو سەنجەقی کەرکوك و سلێمانی و رێگەگرتن لە دروست کردنی تەقەمەنی لەلایەن خەڵکەوە[٢٣٨].

بە پێی راپۆرتێکی تر کە پاش ماوەیەکی کەم لەم راپۆرتەی سەرەوە بەرزکراوەتەوە، ئاماژە بە بوونی کاری ئاژاوەگێڕی دەدات لە ناوچەکانی کەرکوك و گوندەکانی دەوروبەری، ئەمە بێجگە لەوەی کاربەدەستانی ناوچەکە مەترسی ئەوەیان خستووەتەڕوو ئەو ئاژاوانە بپەڕێتەوە بۆ سەنجەقی سلێمانی و ناوچەکانی تر لە ویلایەتی موسڵ، هەر بۆیە داواکراوە بە گواستنەوەی فەریق (عەبدوڵڵا پاشا)ی والی دیاربەکر بۆ ویلایەتی موسڵ، ئەمەش بۆ ئەوەی والی تازە بتوانێت ئاسایش بۆ ناوچەکە بگەڕێنێتەوە[٢٣٩].

لە لایەکی تر لە راپۆرتێکی موشیری فەیلەقی شەشی هەمایونی لە بەغدا هاتووە کە هەوڵەکانیان بەردەوامن بۆ پاراستنی ئاسایشی رێگەکانی کەرکوك و بەغدا و موسڵ و سلێمانی. ئەمە بێجگە لەوەی لە راپۆرتەکەدا ئاماژە بە بوونی ئاژاوە دەدات لە کفری و خورماتوو و داقوق کە ئەمەش بووەتە هۆی زیان پێگەیاندن بە کاروانە بازرگانییەکان. هەروەها پێدەچێت سەرکردە تاڵەبانییەکان دژی دەوڵەت وەستابن و مل کەچ نەبووبن بۆ دەوڵەتی عوسمانی، بۆیە لە راپۆرتەکەدا داوای ئەوە دەکات کە کۆتایی بە ئاژاوەی گەورەکانی تاڵەبانییەکان بهێنرێت، ئەمە بێجگە لەوەی داوا دەکات لەسەر هێشتنەوەی هەمەوەندەکان لەژێر فشار و کۆتایی هێنان بە فشاری هۆزی داودە بۆ سەر رێبواران[٢٤٠]. لە درێژەی کێشە هۆزایەتییەکانی ناوچەی کەرکوك ئاژاوە لەنێوان هۆزەکانی داودە و جاف و تاڵەبانییەکاندا دروست کردبوو، هەر بۆیە کاربەدەستانی ناوچەکە هەوڵی ئەوەیان داوە ئەو شتانەی کە لە هۆزی داودە تاڵان کراون بۆیان بگەڕێنرێتەوە[٢٤١].

لە راستیدا بوونی ئاژاوەی نێوان هۆزەکان و بوونی هەندێ جوڵانەوە دژ بە دەوڵەت ئەوە ناگەیەنێت کە بارودۆخی ناوچەکە تەواو نائارام بووە و ژیانی خەڵکی بە تەواوی پەکی کەوتووە. ئەمە بێجگە لەوەی کە ئەو کاروبارانەی هەندێ لە هۆزەکان پێی هەڵساون هەموویان کاری ئاژاوەگێڕی و چەتەگەری نەبوونە هەروەکو عوسمانییەکان لە راپۆرتەکاندا لە رووانگەی خۆیانەوە ئەو جۆرە نازناوانەیان بۆ داناون، بەڵکو هەندێ لەو کارانە نارەزایی بوون دژ بە دەسەڵاتداریێتی ناوچەکە یان جۆرێك لە جوڵانەوە و بزاڤ و هەوڵ دانی خەڵکی ناوچەکە بووە بۆ کەم کردنەوەی ئازارەکانیان ئەمەش هەندێ جار بە هۆی زۆری باجەکان و خراپی کاربەدەستانی دەوڵەت و هەوڵدان بۆ بە زۆر بە سەربازکردنی خەڵکی روویان داوە، هەروەکو پێشتر ئاماژەمان بە هەندێ لەو هۆکارانە کردووە.

دەوڵەتی عوسمانی بۆ پاراستن و کۆنترۆڵکردنی رێگەو بانەکان و زاڵبوون بەسەر هەندێ لە کاری چەتەگەری و زیاتر باڵادەست بوون بەسەر بارودۆخی شارەکان، هەر بۆیە دوای گەڕانەوەی عوسمانییەکان لە جەنگی رووسیا لە ساڵی (١٨٧٨)ی زایینیدا هەڵسان بە دامەزراندنی چەندین حامیاتی سەربازی و بنکەی پۆلیس لە رێگەو بانەکاندا، ئەمانەش بە درێژایی رێگەکان دامەزرا بوون و بڵاوەیان پێکرابوو بە جۆرێك درێژی نێوان هەر بنکەیەك لەگەڵ بنکەکەی تردا لەنێوان (٣٠) تا (٤٠) کیلۆمەتر دەبوو. شایەنی باسە ئەو

ڕێگایانەی کە ئەم بنکانەیان تێدا دامەزرێنرابوو ڕێگەی سراتیژی بوون و بە ڕێگەی سوڵتانی ناسرابوون. ئەم بنکە سەربازییانە بە درێژایی ڕێگەکانی نێوان (تەلعەفەر، کەلەك، هەولێر، ئاڵتون کۆپری، داقوق، خورماتوو، کفری، جەلەولا، بەغدا) پێکهاتبوون[٢٤٢]. ئەمە بێجگە لە بوونی حامیەی سەربازی عوسمانی لە شارەکاندا، لە ناویاندا شاری کەرکوکیش کە ژمارەی سەربازانی عوسمانی نزیکەی ٤٥٠٠ سەرباز بوون[٢٤٣].

لێرەدا پێویستە تێبینی ئەوە بکەین کە هۆکاری سەرەکی لە دانانی ئەم ڕێگە سەربازییانە دەگەڕێتەوە بۆ دەرکپێکردنی عوسمانییەکان لە خراپبوونی ئاسایشی ڕێگاوبان و شارەکان، هەر بۆیە ئەم کارە یەکێك بوو لەو سیاسەتانەی کە عوسمانییەکان لە ناوچەکە پێڕەویان کرد بۆ کۆنترۆڵکردنی ئاسایشی شارەکان، ئەمە بێجگە لەوەی مەبەستی دەوڵەتی عوسمانی لە دانانی ئەم هێزانە لە ڕێگەوبانەکاندا بۆ یارمەتیدانی هێزی ناو شارەکان بوو کە بە حامیەی عوسمانی لە شارەکان دەناسران.

*** پەیوەندی کەرکوك لەگەڵ ئەیالەت و میرنشینەکانی دەوروبەری:**

**یەکەم. پەیوەندی لەگەڵ هەردوو ئەیالەتی بەغدا و موسڵ:**

**أ. ئەیالەتی بەغدا:**

لە بەشەکانی پێشتردا تیشکێکمان خستە سەر پەیوەندی نێوان ئەیالەتی بەغداو کەرکوك، ئەوەمان ڕوون کردەوە کە تاوەکو کۆتایی سەدەی حەڤدەش ئەیالەتی شارەزوور کە مەڵبەندەکەی کەرکوك بوو سەربەخۆ بوو لە ڕووی کارگێڕییەوە، کە وەکو ئەیالەتەکانی تر ڕاستەوخۆ بە ئەستەمبوڵەوە بەسترا بوو. بەڵام لە سەردەمی (حەسەن پاشا) (١٧٠٤-١٧٢٣)ی زایینی و (ئەحمەد پاشا)ی کوڕیدا (١٧٢٣-١٧٤٧)ی زایینی بەرە بەرە کەوتە ژێر سەرپەرشتی کارگێڕی والی بەغدا. دواتریش لە سەردەمی فەرمانڕەوایی مەمالیکەکاندا لە بەغدا (١٧٥٠-١٨٣١)ی زایینی ئەیالەتی شارەزوور زیاتر کەوتە ژێر دەسەڵاتی والییەکانی بەغدا، بێگومان ئەمەش ڕەنگدانەوەی هەبوو لەسەر پەیوەندییەکانی هەردوو لا، کە لە ڕووداو پێشهاتەکانی ناوچەکەدا بەرجەستە دەبوو.

یەکێك لەم ڕووداوانە هێرشی (عەلی پاشا)ی مەملوکی(١٨٠٢-١٨٠٧)ی زایینی بوو بۆ سەر هۆزی بلباس[٢٤٤] لە ساڵی (١٨٠٢) [٢٤٥]. ئەوەی کە لەم هێرشەدا پەیوەندی بە بابەتەکەی ئێمەوە هەیە ئەوەیە کە والی ناوبراو دوای ئەوەی تاڵانێکی زۆری لەم هۆزە دەستکەوت کە نزیکەی شەست هەزار سەر مەڕو بزن و هەزار مانگا و هەزار ئاژەڵی بەرزو بارگیر، بەشێکی ئەم تاڵانییە درا بە خەڵکی کەرکوك و گوندەکانی دەوروبەری ئاڵتون کۆپری، ئەمەش وەکو قەرەبوویەك بۆ ئەو زیانانەی کە ئەنجامی هێرشی هۆزی بلباس ناوچەکە بەری کەوتبوو[٢٤٦]. هەروەها پێدەچێت هێزەکانی کەرکوکیش لە پاڵ والی بەغدا بەشداریان لەم هێرشەدا کردبێت، چونکە ئەم ڕووداوە پەیوەندی بە ناوچەکانی کەرکوکەوە هەبووە. ئەمە بێجگە لەوەی زۆربەی جارەکان بە هۆی ئەو دەست ڕۆیشتنەی کە والییەکانی بەغدا بەسەر کەرکوکەوە هەیان بووەو کاتێك هاتوونەتە ناوچەکە بۆ لێدان و لەناوبردنی هەر جوڵانەوەیەك هێزی کەرکوك بەشدارو پاڵپشتیان بووە وەك لە ڕووداوەکانی دواتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە.

ململانێی نێوان میرانی بابان و والییەکانی مەمالیك لە بەغدا ڕەنگدانەوەی تەواوی هەبوو لەسەر پەیوەندی نێوان بەغداو کەرکوك. ئەوەتا کاتێك (ئەوڕەحمان پاشا)ی بابان لە ساڵی (١٨٠٦)ی زایینیدا کە لەگەڵ والی بەغدا کەوتە کێشەو شەڕەوەو پاشای بابان هێزی لە نزیك سلێمانی کۆکردەوە، والی بەغدا هێزێکی بە سەرکردایەتی (خالید پاشا)ی بابان نارده کەرکوك بۆ ئەوەی لەوێوە بەرەو سلێمانی بچێت، دواتر بە فەرمانێك داوای لە موتەسەلیمی کەرکوك کرد بۆ یارمەتی دانی (خالید پاشا)ی بابان، دیارە ئەم یارمەتییە دابینکراوە، بە جۆرێك هێزی کەرکوك بە نیزامی و یەدەگەوە خۆی لە چوار هەزار سەرباز دەدا[٢٤٧].

لێرەدا ڕوون دەبێتەوە کە دەسەڵاتدارانی کەرکوك لەم سەردەمەدا وابەستەی ئەیالەتی بەغدا بوونە بە جۆرێك دەسەڵاتدارانی بەغدا هێزی کەرکوکیان بۆ مەبەستە سەربازییەکان و بەرژەوەندییەکانی خۆیان بەکارهێناوە، بەڵام هەموو جارێك ئامانجەکانیان نەپێکاوە، ئەوەتا لەم ڕووداوەی سەرەوەدا دوای ڕووبەڕووبونەوەی والی بەغدا لەگەڵ (ئەوڕەحمان پاشا)ی بابان هێزی بەغدا بە توندی تێك شکێنراوە تەنانەت (سلێمان کەتخودا)ی والی بەغدا لەم شەڕەدا بەدیل گیرا[٢٤٨]. بێگومان هێزەکانی کەرکوکیش لەم شەڕەدا زیانیان لێکەوتووە.

یەکێك لەو خاڵانەی کە پەیوەندی نێوان ئەیالەتی بەغداو کەرکوکی دیاری کردووە بریتی بوو لە بەکارهێنانی خاکی کەرکوك لەلایەن والییەکانی بەغداوە بۆ کۆکردنەوەو ڕێکخستنی هێزەکانیان لە شاری ناوبراو، بە تایبەتی لە کاتی دروست بوونی مەترسییەکانی ئێران لەسەر کەرکوك و ڕاپەڕینەکانی بابانەکان دژی ئەیالەتی بەغدا، والییەکانی بەغدا پێڕەوی ئەم ڕێبازەیان کردووە، هەروەها هێزی کەرکوکیش چۆتە پاڵیان. لە لایەکی تر زۆربەی کات ئەو هێزانەی کە لە موسڵ و هەولێریشەوە نێردراون بۆ یارمەتی دانی والی بەغدا هەر لە کەرکوك کۆکراونەتەوەو ڕێکخراون. کەواتە کەرکوك لە سەردەمی فەرمانڕەوایی مەمالیکەکاندا ڕۆڵی مەڵبەندێکی سەربازی بینیوە لە ناوچەکە، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە لەکاتی شەڕو شۆڕەکاندا کەرکوك زۆربەی کات پروشکی شەڕەکانی بەربکەوێت، بەبێ ئەوەی بەرژەوەندی لەم شەڕانەدا هەبێت یان ڕۆڵی هەبوبێ لە هەڵگیرساندنیاندا.

جێگەی سەرەنجە ئەمەی پێشتر ئاماژەمان پێدا لە زۆربەی باردا دژی کوردو بزاڤەکانی باشووری کوردستان بەکارهاتووە بە تایبەتی لە کاتی ململانێی نێوان والییەکانی بەغداو میرانی باباندا. ئەوەتا کاتێك لە ساڵی (١٨٠٨)ی زایینیدا پەیوەندی نێوان (سلێمان پاشای بچوك)ی

والی بەغداو (ئەورەحمان پاشا)ی بابان تێك دەچێت[٢٤٩]. والی بەغدا دوای ئەوەی بە سەرکردایەتی هێزێك لە بەغداوە بەرێکەوت لە کەرکوك سەربازگەی داناو ژمارەی جەنگاوەرانی گەیشتە حەوت هەزار سەرباز پاش ئەوەی هەندێ لە هۆزو عەشایرەکانی ناوچەکەش چوونە پاڵی[٢٥٠]. هەروەها هێزی موسڵ‌و هەولێرو هەندێ لە میرانی بابانیش کۆمەکی والی بەغدایان کرد[٢٥١]. والی ناوبراو ئەم هێزانەی لە کەرکوك کۆکردنەوەو ڕێکی خستن بۆ دەرچوون بەرەو شوێنی مەبەست‌و دواتر توانی سەرکەوتن بەسەر پاشای باباندا بەدەست بهێنێت لە شەڕێکدا کە لە دەربەندی بازیان لە ساڵی (١٨٠٨)ی زایینیدا ڕوویدا[٢٥٢].

هەروەها دەسەڵاتدارانی بەغدا هێزەکانی کەرکوکیان لە دژی دوژمنانی تریان بەکارهێناوە، وەك ئەم شاڵاوەی کە والی بەغدا لە ساڵی (١٨٠٩)ی زایینیدا بردیە سەر ماردین‌و[٢٥٣] تیایدا هێزی کەرکوك‌و سەرکردە سەربازییەکانی شارەکەی لەگەڵ خۆیدا برد، کە لە ئەنجامدا موتەسەلیمی کەرکوك دەستگیرکرا[٢٥٤].

ئەم دەسەڵاتەی ئەیالەتی بەغدا بەسەر کەرکوك وای کردبوو کە ئەیالەتی دوایی نەتوانێ لە بەرانبەر قەوارەو میرنشینە جیاجیاکانی دەورووبەریدا سیاسەتێکی وای هەبێت کە گوزارشت لە بەرژەوەندی‌و دەسەڵاتی ڕاستەقینەی خۆی بکات، بەڵکو لە هەڵوێستەکانی زیاتر بەرژەوەندی‌و کەسایەتی ئەیالەتی بەغدا ڕەنگی دەدایەوە. ئەوەتا دەسەڵاتدارانی کەرکوك ناچاربوون هێرش بکەنە سەر ئەیالەتی موسڵ لە چوارچێوەی شاڵاوی والی بەغدا بۆ سەر ئەیالەتەکە[٢٥٥]. لە کاتێکدا خۆیان هیچ کێشەیەکیان لەگەڵ موسڵدا نەبووە، کە بێگومان ئەمەش کاریگەری خراپی لەسەر پەیوەندی نێوان کەرکوك‌و موسڵ دا هەبووە.

جێگەی باسە بە هۆی ئەو دەسەڵاتەی کە ئەیالەتی بەغدا لەسەر کەرکوك هەی بووە بووەتە هۆی ئەوەی هەندێ جار دەسەڵاتدارانی کەرکوك هەڵوێست وەربگرن بەرانبەر ئەیالەتی بەغداو هەوڵ بدەن بۆ کەمکردنەوەی دەسەڵاتی ئەیالەتی ناوبراو لەسەر کەرکوك. وەك ئەوەی لە ساڵی (١٨١٢)ی زایینیدا جۆرێك لە هاوپەیمانی‌و لێك نزیك بوون لەنێوان کەرکوك‌و موسڵ‌و میرنشینی باباندا دروست بوو دژی ئەیالەتی بەغدا. شایەنی باسە والی بەغدا (عەبدوڵلا پاشای توتنچی) دوای ئەوەی لە شەڕی کفری بەسەر (ئەورەحمان پاشا)ی باباندا زاڵ بوو توانی باڵێکی ئەم هاوپەیمانێتیە تێك بشکێنێت[٢٥٦]، دوای ئەوەی والی موسڵ لە ڕێگەی بەخشینی دیاری بە والی بەغدا خۆی دەرباز کرد[٢٥٧]. دواتر والی بەغدا ڕووی کردە کەرکوك چەندین کەسایەتی شارەکەو ئەندامانی هۆزەکانی دەستگیرکرد کە بەشداربوون لە هاوپەیمانی دژی والی بەغدا[٢٥٨].

دیارە دەسەڵاتدارانی بەغدا تەنها لە ڕوانگەی بەرژەوەندی خۆیانەوە سەیری کەرکوکیان کردووەو سەربازو خاکی کەرکوکیان بەکارهێناوە، بۆیە هەندێ جار پەیوەندی نێوان کەرکوك‌و بەغدا تێك چووە، ئەمەش بە هۆی گوێنەدانی بەغدا بە بارودۆخی کەرکوك‌و پشت گوێ خستنی شارەکە. ئەوەتا لە سەردەمی (سەعید پاشا)ی والی بەغدا (١٨١٣-١٨١٦)ی زایینی، کاتێك کەرکوك بە ئاژاوەیەکی چەند مانگیدا تێپەڕی‌و بارودۆخی کارگێڕی شارەکە لەوپەڕی خراپیدا بوو والی ناوبراو هیچ جۆرە هەوڵێکی نەدا بۆ چاککردنی بارودۆخی کەرکوك[٢٥٩]. ئەمەش کاردانەوەی خراپی هەبوو لەسەر پەیوەندی نێوان کەرکوك‌و بەغدا هەر بۆیە لە کۆتایی فەرمانڕەوایی (سەعید پاشا)دا خەڵکی شارەکە دژایەتی خۆیان بۆ (سەعید پاشا) ڕاگەیاندو[٢٦٠] پاڵپشتی (داود پاشا)یان کرد کە نەیاری سەعید پاشا بوو[٢٦١]، دواتر ڕۆڵی کاریگەرییان بینی لە یارمەتیدانی (داود پاشا) بۆ گەیشتنی بە دەسەڵات لە بەغدا[٢٦٢].

دەتوانین بڵێین پەیوەندی نێوان کەرکوك‌و ئەیالەتی بەغدا لە سەردەمی (داود پاشا)دا لەسەر بنەمای یارمەتی دانی یەکتر دامەزرابوو ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ پشت بە یەکتر بەستنی هەردوو کەرکوك‌و بەغدا لەم سەردەمەدا دژی میرنشینی بابان‌و هێرشکاری ئێرانییەکان. بەڵام لە زۆربەی کاتدا والی بەغدا کەرکوکی بۆ ئەم مەبەستە بەکاردەهێنا بە تایبەتی لە شەڕو هەرای ساڵانی (١٨١٨)و (١٨٢١)ی زایینیدا کە پێشتر باسمان کردووە. کاتێکیش عوسمانییەکان بڕیاری لەناوبردنی مەمالیکەکانیان دا لە ساڵی (١٨٣١)ی زایینیدا (عەلی ڕەزا پاشا) بە سوپایەکی گەورەوە چووە سەر بەغدا، دوای تێك شکاندنی هێزەکانی (داود پاشا) و دەستگیرکردنی ویستی پاشای ناوبراو بکوژێت بەڵام خەڵکی کەرکوك‌و هەندێ کەسی تر نەیان هێشت بیکوژن، هەر بۆیە ئەویش داوای پاراستنی ئاسایشی لێکردن‌و (داود پاشا)ی نەکوشت‌و ڕەوانەی ئەستەمبوڵی کرد[٢٦٣].

دوای گەڕانەوەی دەسەڵاتی ناوەندی عوسمانی بۆ بەغدا، هەر چەندە کەرکوك وەکو مەڵبەندی ئەیالەتی شارەزوور مایەوە، بەڵام بەغدا وەکو جاران دەسەڵاتی بەسەریدا دەڕۆیی، هەروەها بە هەمان شێوەی والییەکانی بەغدا فەرمانداریکیان بە ناوی موتەسەلیم لەسەر کەرکوك دادەنا[٢٦٤]. ئەوەتا لە ساڵی (١٨٣٥)ی زایینیدا (عەلی ڕەزا پاشا)ی والی بەغدا (١٨٣١-١٨٤١)ی زایینی (محەمەد پاشا ئینجە بەیرەقدار)ی کردە فەرمانڕەوای شارەزوور، دوای ساڵێك لە فەرمانڕەوایی والی بەغدا گواستیەوە بۆ موسڵ[٢٦٥].

دیارە لەم ماوەیەشدا دەسەڵاتدارانی بەغدا چالاکی سەربازییان لە ناوچەکانی سەر بە کەرکوك نواندووە، بە تایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا کە ئەم ناوچانە ڕووبەڕووی چەندین کێشەو گرفتی هۆزەکان بوونەوە. لە گرنگترین ئەو کێشانە ئەوەبوو کە هۆزی هەمەوەند لە ناوچەکە بەرپای دەکرد[٢٦٦]. هەر بۆیە هێزەکانی بەغدا لە ماوەی جیاجیادا شاڵاوی سەربازییان بۆ ناوچەکە هێناوە، لەوانە شاڵاوی (سەردار ئەکرەم پاشا) لە ساڵی (١٨٥٩)ی زایینیداو[٢٦٧] شاڵاوی (مەدحەت پاشا) (١٨٦٩-١٨٧٢)ی زایینی‌و[٢٦٨] شاڵاوی (تەقی پاشا) (١٨٨٠-١٨٨٧)ی زایینی لە ساڵی (١٨٨٠)ی زایینیدا بۆ سەر هۆزی هەمەوەند[٢٦٩].

هاتنی لەشکری بەغدا بۆ ئەم ناوچەیە بۆ لێدان‌و سەرکوتکردنی هۆزەکان بوو بە واتای لابردنی کێشەیەك

دێت کە ئەیالەتی شارەزوور خۆی دەستەوستان بووە لە بەرانبەریدا، چونکە ئەگەر لەشکری کەرکوک لە توانای دابوایە ئەم کێشانە چارەسەر بکات لەشکری بەغدا نەدەهاتە ناوچەکە، ئەمەش مانای لاوازیو پاشکۆیەتی کەرکوک دەگەیەنێت بۆ ئەیالەتی بەغدا هەرچەندە پەیوەندی نێوانیان دۆستانە بووبێتو لەم شالاوانەدا هەردوولا هاوکاری یەکتر بووین. بۆیە لەم ماوەیەشدا تەرازووی پەیوەندی نێوان کەرکوکو ئەیالەتی بەغدا لە بەرژەوەندی ئەمەی دواییدا بووە.

پەیوەندی نێوان ئەیالەتی بەغداو کەرکوک دوای ساڵی (١٨٧٩)ی زایینی بەرەو کزی چوو، چونکە لەم ساڵەدا کەرکوک سیفەتی ئەیالەتی لێ سەنرایەوەو بووە سەنجەقێکی سەر بە ویلایەتی موسڵ[٢٧٠]. بێگومان ئەمەش کارێکی ئاسایی بوو کە لێرە بە دواوە ئەم ویلایەتە بەرپرس بێت لە پاراستنی ئاسایشی دەڤەری کەرکوک لە جیاتی بەغدا. بەڵام سەرەرای ئەمەش بە هۆی بوونی ئاژاوەی هۆزەکان لە هەردوو سەنجەقی کەرکوکو سلێمانیدا هەندێ جار والی بەغدا خۆی لە بارودۆخی سەنجەقی کەرکوک هەڵقورتاندووە، ئەوەتا (تەقی پاشا)ی والی لە ساڵی (١٨٨٠)ی زایینیدا لە کاتی سەرهەڵدانی ئاژاوەی نێوان جافو هەمەوەندەکان دەست لە بارودۆخەکە وەردەدات لە بەرژەوەندی جافەکان[٢٧١].

هەروەها بە هۆی بوونی ئاژاوەی هۆزەکان لە سەنجەقی کەرکوکدا هەندێ جار رێگەکانی نێوان کەرکوکو بەغدا تووشی ئانارامی دەبوون، هەر بۆیە بەرپرسانی بەغدا هەوڵیان داوە ئاسایشی رێگەکانی نێوان کەرکوکو بەغدا بپارێزن. ئەوەتا لە راپۆرتێکی بەرپرسی فەیلەقی شەشی هەمایونی لە بەغدا کە لە ساڵی (١٨٩٧)ی زایینیدا بەرزکراوەتەوە بۆ ئەستەمبوڵ هاتووە کە ئەوان لە هەوڵەکانیان بەردەوامن بۆ پاراستنی ئاسایشی رێگەکانی نێوان کەرکوکو بەغدا[٢٧٢]. بێگومان ئەمەش مانای بەردەوام بوونی پەیوەندی سیاسیو سەربازی نێوان ویلایەتی بەغداو سەنجەقی کەرکوک دەگەیەنێت هەرچەندە کەرکوک ئەو کات بەشێک بوو لە ویلایەتی موسڵ.

**ب. ئەیالەتی موسڵ:**

ئەیالەتی موسڵ یەکێک بوو لە ئەیالەتە گرنگەکانی دراوسێی کەرکوک، ئەم ئەیالەتە لە باکورو خۆرئاوای ئەیالەتی شارەزوور هەڵکەوتبوو[٢٧٣].

لە باسکردنی پەیوەندی نێوان ئەیالەتی موسڵو کەرکوک پێویست ناکات بۆ سەردەمە بەراییەکان بگەرێینەوە[٢٧٤] بەڵام هاتنی جەلیلییەکان لە موسڵ (١٧٢٦-١٨٣٤)ی زایینی[٢٧٥] بۆ سەر دەسەڵات بووە هۆی زیاتر پەرەسەندنی پەیوەندی لەنێوان موسڵو کەرکوک دا، ئەمە بێجگە لەوەی هاتنی جەلیلییەکان کاریگەری لەسەر پەیوەندی نێوان کەرکوکو ئەیالەتی بەغدا هەبووە هەروەکو لە داهاتوودا روونی دەکەینەوە.

شایەنی باسە یەکێک لە تەوەرەکانی پەیوەندی نێوان بنەماڵەی جەلیلییەکان لە موسڵو کەرکوک بەر لە سەدەی نۆزدەدا خۆی لەوەدا دەبینییەوە کە هەندێ لە ئەندامانی بنەماڵەی جەلیلی بوونە فەرمانرەوای ئەیالەتی شارەزوور بۆ ماوەیەکی دیاریکراوو کاروباری ئەم ئەیالەتەیان بەرێوەبردووە لەوانە (ئەمین پاشای جەلیلی)و (سلێمان پاشای کوری ئەمین پاشای جەلیلی) (١٧٧١-١٧٧٥)ی زایینی، لە راستیدا هۆی ئەمەش دەگەرایەوە بۆ ئەوەی کە ئەو کات پەیوەندی نێوان بابی عالیو ئەیالەتی بەغدا باش نەبووە هەر بۆیە ئەستەمبوڵ بۆ دانانی سنوورێک بۆ ئەیالەتی بەغدا ویستوویەتی هەردوو ئەیالەتی موسڵو شارەزوور بەکاربهێنێت[٢٧٦].

شایەنی باسە ئەیالەتی شارەزوور لە پەیوەندییەکانیدا کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەیالەتی بەغدا، هەر بۆیە ئەمجارەیان هەریەک لە هێزەکانی کەرکوکو موسڵیش هاوکارو یارمەتی دەری والی بەغدا بوون، ئەوەتا لە ساڵی (١٨٠٩)ی زایینیدا کاتێک (سلێمان پاشا)ی والی بەغدا بریاری هێرشی دا بۆ سەر شارەکانی ماردینو ئۆرفەو رقەو سنجار[٢٧٧]، هەریەک لە هێزی موسڵو کەرکوک لە ناو سوپای والی بەغدا بوونو پێکەوە هاوکاری والی بەغدایان کرد لەم هێرشەیدا بۆ سەر ئەو شارانە[٢٧٨].

شایەنی باسە هەرچەندە هەردوو ئەیالەتی شارەزوورو موسڵ هاوسنوور بوون لەگەڵ یەکتردا بەڵام دەتوانین بڵێین پەیوەندییەکانی نێوانیان لە زۆربەی کاتدا دەکەوتە ژێر کارتێکردنی ئەیالەتی بەغدا، ئەمەش بە هۆی ئەو باڵادەستییە بوو کە ئەیالەتی بەغدا لەسەر کەرکوک هەیبوو هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد. هەر ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی کە ئەیالەتی بەغدا هەندێ جار هێزەکانی کەرکوک بەکاربهێنێت لە هێرشەکانیدا بۆ سەر ئەیالەتی موسڵ. ئەوەتا والی بەغدا (عەبدوڵڵا پاشای توتنچی) دوای ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ ئەیالەتی موسڵ تێک چوو لە ساڵی (١٨١٢)ی زایینیدا لە کاتی هێرشەکانیدا بۆ سەر موسڵ کۆمەکی سەربازی لە کەرکوکیش وەرگرت[٢٧٩]، بۆیە دەبینین تێکچوونی پەیوەندی نێوان ئەیالەتی بەغداو موسڵ کاریگەری لەسەر کەرکوک دروست کردووە.

لە لایەکی تر هەندێ جار کەرکوکو موسڵ هاوپەیمانو هاوکاری یەکتر بوونە بۆ لێدانی دەسەڵاتی ئەیالەتی بەغداو هەوڵدان بۆ کەم کردنەوەی دەسەڵاتی ئەیالەتی ناوبراو لەسەر هەردوو لایان. بەڵام ئەم دوو ئەیالەتە لە هەوڵەکانیاندا سەرکەوتوو نەبوون، ئەمەش لە ساڵی (١٨١٢)ی زایینیدا روویدا کاتێک والی بەغدا توانی ئەم هاوپەیمانیە تێک بشکێنێت هەروەکو پێشتر لە پەیوەندی کەرکوک لەگەڵ ئەیالەتی بەغدا ئاماژەمان بۆی کردووە.

هەروەها بەر لە بوونی کەرکوک بە سەنجەقێکی ویلایەتی موسڵ سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بە بوونی پەیوەندی لەنێوانیاندا دەدەن، ئەوەتا بە گوێرەی بەڵگەنامەیەکی عوسمانی کە دەگەرێتەوە بەرواری (٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٨٥٤)ی زایینیدا هاتووە کە دەسەڵاتدارانی کەرکوک ژمارەیەک لە هێزی سەربازی شارەکەیان رەوانە کردووە بۆ یارمەتی دانی والی موسڵ (حیلمی پاشا) بۆ لێدانی

بزوتنەوەی یەزدانشێر[٢٨٠] دژ بە دەوڵەتی عوسمانی[٢٨١]، بێگومان ئەمەش یارمەتیدانی هێزی عوسمانی لە کەرکوك دەگەیەنێت بۆ والی موسڵ بەمەبەستی دامرکاندنەوەی راپەرینی یەزدانشێر.

جێگەی باسە سەرچاوە مێژووییەکان تاوەکو هەڵوەشانەوەی ئەیالەتی شارەزوورو بوونی کەرکوك بە سەنجەقێك لە ویلایەتی موسڵ لە ساڵی (١٨٧٩)ی زایینیدا هیچ رووداوێکی ئەوتۆمان بۆ باس ناکەن کە هەریەك لە ئەیالەتی موسڵو کەرکوکی تێدا کۆبێتەوە. بێگومان هۆی سەرەکی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ باڵادەستی ئەیالەتی بەغدا بەسەر کەرکوكو تەنانەت ئەیالەتی موسڵیشدا. بەڵام دوای ئەوەی لە ساڵی (١٨٧٩)ی زایینیدا کەرکوك بووە سەنجەقێکی سەر بە ویلایەتی موسڵ ئیتر لەوێ بەدواوە کەرکوك نەیتوانی وەك یەکەیەکی کارگێری سەربەخۆ پەیوەندی لەگەڵ یەکە کارگێرییەکانی دەورووبەری دروست بکاتو پەیوەندییەکانی نێوان موسڵو کەرکوك بوو بە پەیوەندی نێوان مەڵبەندی ویلایەتێكو سەنجەقێکی ئەم ویلایەتە. هەر بۆیە لێرەوە بەرپرسیارێتی ئاسایشی سەنجەقی کەرکوك کەوتە ئەستۆی بەرپرسانی ویلایەتی موسڵ وەك سەنجەقێکی ئەم ویلایەتە. بەم پێیە بەرپرسانی ویلایەتی ناوبراو کەوتنە هەوڵدان بۆ راگرتنی ئاسایشی سەنجەقی کەرکوك بە تایبەتی لە رێی رووبەڕووبونەوەی ئاژاوەی هۆزەکان لەم سەنجەقەدا. جێگەی بە بیر هێنانەوەیە کە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی دەڤەری کەرکوك وەکو ناوچەکانی تر لەو سەردەمەدا لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا بریتییە لە بوونی ئاژاوەی هۆزەکان. لەم روانگەیەوە دەبینین چەندین راپۆرت لە ساڵی (١٨٨٦)ی زایینیدا لەلایەن بەرپرسانی ناوچەکە بەرزکراوەتەوە کە ئاماژە بە نائارامی سەنجەقی کەرکوك دەکەن[٢٨٢].

هەر لە ئەنجامی ئەمەدا یەکێك لە تەوەرەکانی پەیوەندی نێوان بەرپرسانی ویلایەتی موسڵو سەنجەقی کەرکوك پیادەکردنی شێوازی لێدانو رووبەڕووبونەوەی ئەو بنەماڵەو هۆزانە بووە کە ویستوویانە لە سەنجەقی کەرکوکدا ئاژاوە دروست بکەن، ئەوەتا لە کاتی بەرپابوونی ئاژاوەی نێوان تاڵەبانیو بەرزنجەکان لە ساڵی (١٨٨٧)ی زایینیدا دەسەڵاتدارانی ناوچەکە چەندین کەسیان لە ئەندامانی ئەم بنەماڵانە دادگایی کردو حوکمیان بەسەردا سەپاندن بە هۆی دەست هەبوونیان لە ئاژاوەکانی نێوان ئەم دوو لایەنەو تۆمەتبار کردنیان بە تێکدانی ئاسایشی سەنجەقی کەرکوك[٢٨٣].

شایەنی باسە بارودۆخی سەنجەقی کەرکوك پەیوەندیو کاریگەری راستەوخۆی لەسەر ویلایەتی موسڵ هەبووە، هەربۆیە بەرپرسانی بابی عالی بۆ پاراستنی ئاسایشی سەنجەقی کەرکوكو تەشەنەنەکردنی ئەو بارودۆخە بە تایبەتی بۆ سەنجەقی سلێمانی هەڵسان بە گۆڕینی والی موسڵو دانانی فەریق (عەبدوڵڵا پاشا)ی والی دیاربەکر لە ویلایەتی موسڵ لە (١٢)ی نیسانی ساڵی (١٨٩٦)ی زایینیدا ئەمەش لەپێناوی نەهێشتنی ئاژاوەی هەردوو سەنجەقی کەرکوكو سلێمانی[٢٨٤]. وا دیارە لەم بارودۆخەدا یەکێك لە تەوەرە گرنگەکانی پەیوەندی نێوان سەنجەقی کەرکوكو مەڵبەندی ویلایەت بریتی بووە لە هەوڵەکانی بەرپرسانی ویلایەتی موسڵ بۆ پاراستنی ئاسایشی ئەم سەنجەقە. هەر بۆیە ئەو بارودۆخەی لە سەنجەقی کەرکوکدا هەبوو کاریگەری ئەوتۆی بەسەر کاربەدەستانی ویلایەت هەبووە تەنانەت لە یەکێك لە راپۆرتەکاندا پێشنیاری ئەوە کراوە کە بۆ چارەسەرکردنی بارودۆخی ئاسایشی ناوچەکە مەڵبەندی ویلایەتی موسڵ لە سەنجەقی موسڵەوە بگوێزرێتەوە بۆ سەنجەقی کەرکوك[٢٨٥]. بێگومان ئەمەش لەپێناوی ئەوەدابووە تاوەکو والی خۆی لە کەرکوکدا دابنیشێت لە نزیکەوە چاودێری بارودۆخی سەنجەقەکە بکات.

یەکێکی تر لە تەوەرەی پەیوەندی نێوان بەرپرسانی ویلایەتی موسڵو سەنجەقی کەرکوك لەم سەردەمەدا بریتی بوو لە هەوڵەکانی بەرپرسانی ویلایەت بۆ چارەسەرکردنی بارودۆخی ئاسایشی سەنجەقی کەرکوك بە بەکارهێنانی چەندین رێگەی چارەسەر، لەوانە بەرپرسانی ویلایەت لە راپۆرتێکیاندا لە ساڵی (١٨٨٧)ی زایینی بۆ کۆتایی هێنان بە بزاڤو جوڵانەوەکانی هەمەوەند دژ بە دەوڵەت داوا دەکەن هەوڵبدرێت نیشتەجێ بکرێنو قوتابخانەیان بۆ بکرێتەوەو دابو نەریتەکانیان بگۆردرێ بۆ ئەوەی لەم رێگەیەوە وا لە هەمەوەندەکان بکەن واز لە جوڵانەوەکانیان بهێنن دژی دەوڵەت.

هەروەها بەرپرسانی ویلایەتی موسڵ لە رێگەی کارمەندەکانیان لە سەنجەقی کەرکوك توانیان لە رێگەی (دەستەی ئاشتکردنەوە) کە لە شاری کەرکوكو سلێمانیدا دایانمەزراند بوو هەندێ لە کێشە عەشایرییەکان بە رێگەی ئاشتیانە لە جیاتی بەکارهێنانی هێز چارەسەر بکەن، لەوانە کێشەی نێوان شوانو هەمەوەندەکان بە هۆی ئەم دەزگایە لە ساڵی (١٨٩٨)ی زایینیدا چارەسەرکرا[٢٨٦]. هەر بۆیە کاربەدەستانی ویلایەتی موسڵ لە چوارچێوەی سیاسەتەکانیاندا لە بەرانبەر سەنجەقی کەرکوك سیاسەتی میانرەویو هەندێ جار سیاسەتی بەکارهێنانی چەکیان پەیرەو کردووە بۆ راگرتنی ئاسایشی سەنجەقی کەرکوك. بێگومان هەر ئەم خاڵە سەرەکیانە تەوەرەی پەیوەندی نێوان مەڵبەندی ویلایەتو سەنجەقی کەرکوکی دیاری دەکرد.

*** پەیوەندی کەرکوك لەگەڵ قەوارەو میرنشینە کوردییەکان:**

**أ. میرنشینی بابان:**

لە بابەتەکانی پێشتر تیشکێکمان خستە سەر پەیوەندی کەرکوك لەگەڵ هەردوو ئەیالەتی بەغداو موسڵ لەم تەوەرەیەشدا هەوڵ دەدەین خاڵە سەرەکییەکانی پەیوەندی نێوان کەرکوكو میرنشینی بابان روون بکەینەوە لە چوارچێوەی ئەو سەردەمە مێژووییەی لێکۆڵینەوەکەمان دەیگرێتەوە.

یەکێك لە تەوەرەکانی پەیوەندی نێوان میرنشینی بابانو کەرکوك بریتی بوو لە پەیوەندی نێوان هەندێ لە میرانی بابان لەگەڵ هەندێك لە هۆزو عەشایرەکانی دەڤەری کەرکوك کە

لەسەر بنەمای هاوکاریو یارمەتیدانی یەکتر دامەزرابوو، ئەوەتا (ئەوڕەحمان پاشا)ی بابان یەکێك بووە لەو میرە بابانیانەی کە پەیوەندی توندو تۆڵی لەگەڵ دەڤەری کەرکوکدا هەبووە، ئەم میرە لە سەردەمی خۆیدا چەندین جار هاوپەیمانی لەگەڵ هۆزو تیرەکانی ناوچەی کەرکوکدا بەستووەو عەشایرەکانی ئەم دەڤەرە لە چەندین بارودۆخدا هاوکاری (ئەوڕەحمان پاشا)ی بابانیان کردووە. ئەوەتا لە ساڵی (١٨١٠)ی زایینیدا کاتێك (ئەوڕەحمان پاشا)ی بابان لەگەڵ نوێنەری ئەستانەدا (حالەت سەعید ئەفەندی)دا ڕێك کەوتن بۆ لابردنی (سلێمان پاشا)ی بچووك لەسەر دەسەڵاتی ئەیالەتی بەغدا، پاشای بابان بە هێزەکەیەوە هاتە کەرکوك بۆ ئەوەی لەوێوە بەرەو بەغدا بەرێ بکەون. هەر بۆیە پاشای بابان لە دەڤەری کەرکوکدا دەستی کرد بە پەیوەندی کردن بە ژمارەیەك لە هۆزو عەشایرەکانی ناوچەکە بۆ ئەوەی هاوکاری بن لەم هێرشەدا بۆ سەر بەغدا، لە ئاکامدا هەندێ لە هۆزەکانی کەرکوك چوونە پاڵ پاشای بابانو بوونە هاوکارو یارمەتیدەری، و پاشای ناوبراو توانی لەم هۆزانە سوودمەند بێت[٢٨٧].

ئەوەی جێگەی سەرەنجە کە خەڵکی کەرکوك لەم کارەدا نەك تەنها هاوپەیمانو هاوکاری پاشای بابان بوون، بەڵکو دەتوانین بڵێین ئەم کارە مانای بەشداری خەڵكو هۆزەکانی کەرکوکیش دەگەیەنێت لە ڕووخانو لەناوبردنی یەکێك لە پاشاکانی دەسەڵاتی مەملوکی لە بەغداو لە ئاکامی ئەم کردارە سەربازییەدا کە دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە ناوچەکە ڕێکیان خست (سلێمان پاشا)ی بچوکی والی بەغدا لە ساڵی (١٨١٠)ی زایینیدا کوژرا[٢٨٨].

لە لایەکی تر (ئەوڕەحمان پاشا)ی بابان لە درێژەی هەوڵەکانیدا لە ناوچەی کەرکوك توانی دۆستو لایەنگری زۆر بۆ خۆی پەیدا بکات تەنانەت دەسەڵاتی پاشای بابان لە ناوچەی کەرکوکدا لە هاوکاریو هاوپەیمانی لەگەڵ هۆزو عەشایرەکانی ناوچەکەدا تێپەڕی کردوو توانی لەگەڵ ژمارەیەك لە کاربەدەستانی کەرکوك هاوپەیمانیو هاوکاری دروست بکات بۆ دژایەتی کردنی دەسەڵاتی والی بەغدا لە دەڤەری کەرکوکدا. ئەوەتا کاتێك والی بەغدا (عەبدوڵڵا پاشای توتنچی) لە ساڵی (١٨١٢)ی زایینیدا دوای ئەوەی لە شەڕی کفری دا بەسەر پاشای باباندا زاڵبوو بڕیاری دا هاوکارو هاوپەیمانانی پاشای ناوبراو لە دەڤەری کەرکوکدا دەستگیر بکات. هەر بۆیە کاتێك والی بەغدا ڕووی کردە کەرکوك بینی تەواوی سەرۆکەکانی شارەکەو دەوروبەری کەرکوكو عەشایرەکان لە ژێرەوە بە نهێنی هاوکارو یارمەتی دەری (ئەوڕەحمان پاشا)ی بابان بوون[٢٨٩]. کە لە ئاکامدا والی بەغدا ژمارەیەکی زۆر لە کاربەدەستانی کەرکوکی دەستگیرکرد لەوانە موتەسەلیمی کەرکوك کە بەرزترین بەرپرسی شارەکە بوو، دواتر هەریەك لە (خەلیل ئاغا)و قازی شارەکە (عەبدولفەتاح ئەفەندی)و شێخی شەممەر کە بە (شێخ شاتی) ناسرابوون دەستگیرکران[٢٩٠]. هەروەها والی بەغدا لە درێژەی هەڵمەتی دەستگیرکردنی هاوپەیمانانی (ئەوڕەحمان پاشا)ی باباندا لە کەرکوك ئاڵای (بیگی مەحمود بەگ)و سەرۆکی هێزی یەنیچەری پێشووی بەغدا (قاسم ئاغا)ی لە شارەکەدا دەستگیرکرد. جێگەی باسە والی موسڵیش لەم هاوپەیمانیەدا بەشدار بوو[٢٩١]. بێگومان بوونی ئەم جۆرە هاوپەیمانیو هاوکارییە مانای بەهێزی پەیوەندی نێوان کەرکوكو میرنشینی بابان دەگەیەنێت لە سەردەمی (ئەوڕەحمان پاشا)ی باباندا. بەڵام زاڵبوونو باڵادەستی ئەیالەتی بەغدا بەسەر ئەیالەتی شارەزوور کاریگەری خراپی بەسەر ئەم هاوپەیمانیو پەیوەندی نێوانیان هەبووە. لەلایەکی تر بوونی هاوپەیمانییەکی لەم جۆرە لەنێوان پاشای بابانو هۆزو کاربەدەستانی کەرکوك مانای فراوانی دەسەڵاتی بابانەکان دەگەیەنێت لە ناوچەی کەرکوکدا لە سەردەمی (ئەوڕەحمان پاشا)ی باباندا.

لە سەردەمی (مەحمود پاشا)ی کوڕی (ئەوڕەحمان پاشا)ی باباندا پەیوەندی نێوان کەرکوكو بابانییەکان هەر بەردەوام بوو، بەڵکو لەم سەردەمەشدا چەندین شەڕو ئاژاوە لە ناوچەکەدا ڕووی داوە کە قەبارەی پەیوەندی نێوان کەرکوكو بابانەکانمان بۆ دیاری دەکات.

جێگەی باسە لەم سەردەمەدا دیسان کەرکوك لە ڕووداوەکانی ناوچەکەدا ئاڵاوە، هۆی ئەم تێوەگلانەش لە دوو سۆنگەوە بووە، یەکێکیان بە هۆی باڵادەستیو دەست ڕۆیشتوویی والییەکانی بەغداو مەمالیکەکان کە بەسەر کەرکوکدا هەیان بوو، ئەوی تریان لە ئەنجامی ململانێی نێوان میرانی بابانو بەغداو دەستێوەردانی ئێرانییەکان لە بارودۆخی ناوچەکە هاتووەتە ئاراوە، ئەمە بێجگە لە بوونی هاوپەیمانیو لایەنگرانی بابان لە ناوچەی کەرکوکدا. ئەوەتا کاتێك (سەعید پاشا)ی والی بەغدا بڕیاری لەسەرکار لابردنی (مەحمود پاشا)ی بابانی دەرکرد سوپایەکی نارد بە سەرکردایەتی (عەبدوڵڵا پاشا)ی مامی (مەحمود پاشا) بۆ کەرکوك بۆ لێدانی پاشای لەسەرکار لابراو، بێگومان ئەمەش بووە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕ لە ناوچەکەدا[٢٩٢].

دوای ئەوەی (مەحمود پاشا)ی بابان داوای یارمەتی لە ئێران کرد، نزیکەی (١٠) هەزار سەربازی ئێرانیش گەیشتنە ناوچەکە بۆ یارمەتی دانی پاشای بابان[٢٩٣]. دواتر (مەحمود پاشا)ی بابان نامەیەکی توندی بۆ کاربەدەستانی کەرکوك نارد، سەرەتا لە نامەکەیدا بوونی پەیوەندی لە مێژینەی نێوان کەرکوكو بابان بەرز دەنرخێنێت، دواتر بە توندی ڕەخنە لەوە دەگرێت کە ئێستا کەرکوك بووەتە جێگەی پەنادانی نەیارانی بابانو داوا دەکات (عەبدوڵڵا پاشا) ی مامی لە شارەکە دەربکرێت لەبەر ئەوەی میری بابان بوونی ئەو سوپایە لە کەرکوکدا بە مانای هەڕەشە دەزانێت بۆ سەر بابان کە والی بەغدا پاڵپشتی دەکرد، بۆیە داوا لە کاربەدەستانی کەرکوك دەکات هەوڵ بدەن ئەو سوپایە بگەڕێنەوە بۆ بەغدا[٢٩٤].

لە لایەکی تر (مەحمود پاشا)ی بابان لە نامەکەیدا بۆ موفتی کەرکوك داوا دەکات کاربەدەستانی کەرکوك یارمەتە بۆ ئێرانییەکان بنێرن تاوەکو کەرکوك لە بەڵای لەشکری ئێرانییەکان سەلامەت بێت[٢٩٥]. لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە بە هۆی ئەو دەسەڵاتەی کە ئەیالەتی بەغدا لەسەر شارەزوور

هەبیبوو پەیوەندی نێوان کەرکوك‌و بابانەکان درزی تێکەوتووەو تووشی ساردبوونەوە بووە، ئەمەش بە هۆی رازی نەبوونی بابانەکان بە بەکارهێنانی خاکی کەرکوك وەك سەربازگەیەك لە دژی ئەوان. بێگومان هەر ئەم بارودۆخەش بووەتە هۆی دروست بوونی مەترسی ئێرانییەکان لەسەر کەرکوك کە هەندێ جار بابانەکان چاوساغی بوون.

وادیارە بەکارهێنانی خاکی کەرکوك دژ بە میرەکانی بابان لەلایەن والییەکانی بەغداوە، زۆر جار کاریگەری خراپی لەسەر پەیوەندی نێوان کەرکوك‌و بابان دروست کردووە. هەر بۆیە دەبینین چەندین جار والییەکانی بەغدا شاری کەرکوکیان کردبووە سەربازگەی خۆیان بۆ لێدانی بابانەکان هەروەکو پێشتریش ئەمەمان روون کردەوە، لە ئاکامیشدا کاتێك بابانەکان داوای هاوکاری ئێرانیان کردووە ئەمەش بووەتە مایەی دروست بوونی مەترسی ئێرانییەکان لەسەر کەرکوك. ئەوەتا کاتێك خاکی کەرکوك لە ساڵی (١٨١٨)ی زایینیدا دژی (مەحمود پاشا) بەکارهات لەلایەن (داود پاشا)ی والی بەغداوە[٢٩٦]، ئێرانییەکان کە هاتنە ناوچەکە بۆ یارمەتی دانی (مەحمود پاشا) مەترسیان لەسەر شاری کەرکوك دروست کرد[٢٩٧]. هەر بۆیە دەبینین ئەو دەسەڵاتەی کە ئەیالەتی بەغدا بەسەر کەرکوکەوە هەیبوو کاریگەری خراپی دەکردە سەر پەیوەندی نێوان کەرکوك‌و بابانەکان، بەڵکو ئەگەر خاکی کەرکوك لەلایەن والییەکانی بەغدا بەکارنەهاتبایە مەترسی ئێرانیش لەسەر کەرکوك بە تەواوی کەم دەبووەوە.

شایەنی باسە ململانێی نێوان میرانی بابانیش لە نێو خۆیاندا کاریگەری بەسەر بارودۆخی کەرکوکەوە هەبووە، ئەمەش بە هۆی دابەشبوونی لایەنگیریەتی میرانی بابان لەنێوان عوسمانی‌و ئێراندا، هەر بۆیە دەبینین زۆر جار راسپاردنی سوپای کەرکوك لەلایەن والی بەغداوە بۆ لێدانی ئەم میرە بابانییەی لایەنگری ئێرانە بووەتە هۆی دروست بوونی مەترسی ئێرانییەکان لەسەر کەرکوك بە تایبەتی لە کاتی تێك شکاندنی سوپای کەرکوك‌و بەغداو کشانەوەیان کە هەندێ جار گەمارۆدانی شاری کەرکوکی لێ کەوتۆتەوە. ئەوەتا لە ساڵی (١٨٢١)ی زایینیدا کاتێك (عەبدوڵڵا پاشا)ی مامی (مەحمود پاشا) رای کردە ئێران‌و بە یارمەتی هێزی ئێرانییەکان رووی کردەوە بابان بۆ لێدانی برازاکەی[٢٩٨]. هەر بۆیە کاتێك هێزی (مەحمود پاشا)و (کەتخودا)ی والی بەغدا لە بەرانبەر (عەبدوڵڵا پاشا)و ئێرانییەکان تێك شکان‌و گەرانەوە لە ئاکامدا کەرکوك لەلایەن هێزی ئێرانەوە گەمارۆدراو زەرەرو زیانێکی زۆر بەر خەڵکی شارەکە کەوت[٢٩٩].

یەکێك لەو خاڵانەی کە کاریگەری لەسەر پەیوەندی نێوان کەرکوك‌و باباندا هەبووە خۆی دەبینێتەوە لەوەی کە هەندێ لەو میرە بابانییانەی بە دژایەتی میری فەرمانرەوای بابانیان دەکرد زۆر جار رایان دەکردە کەرکوك، کە لە ئاکامدا والی بەغدا هەڵدەستا بە پاڵپشتیکردنیان بۆ لێدانی میری دەسەڵاتدار لە سلێمانی. جێگەی باسە هەندێ لەو میرە هەڵاتووانە زۆربەی کات لە کەرکوك بوون‌و ئەم شارەیان کردبووە پەناگەی خۆیان بە پاڵپشتی والییەکانی بەغدا لەم شارەدا جۆرێك لە سەربازگەیان هەبووەو لێرەوە دژایەتی فەرمانرەوایەتی بابانیان کردووە[٣٠٠]. ئەوەتا لە سەردەمی (ئەورەحمان پاشا)ی باباندا (خالید پاشا)ی مامی ئەم رۆڵەی بینیووە هەروەها ئەم میرە بە پاڵپشتی والی بەغداو بە هۆی فەرمانی والی ناوبراو بۆ موتەسەلیمی کەرکوك بۆ یارمەتی دانی (خالید پاشا) دژایەتی (ئەورەحمان پاشا)ی برازای کردووە[٣٠١]. لێرەدا دەتوانین بڵێین زۆربەی کات ئەم میرە لە کەرکوکەوە دژایەتی (ئەورەحمان پاشا)ی کردووە. هەروەها هەمان دیاردە بۆ سەردەمی (مەحمود پاشا)ی بابانیش راستە ئەوەتا لەم سەردەمەدا (عەبدوڵڵا پاشا)ی مامی (مەحمود پاشا)ی بابان دژایەتی برازاکەی کردووە لەسەر تەختی بابان هەر بۆیە والییەکانی بەغدا هاوکاریان کردووەو زۆرجار بە هۆی فەرمانی والییەکانی بەغدا موتەسەلیمی کەرکوکیش یارمەتی پێشکەش بە (عەبدوڵڵا پاشا) کردووە[٣٠٢]. بێگومان ئەمەش کاردانەوەی خراپی لەسەر پەیوەندی نێوان کەرکوك‌و میرنشینی بابان هەبووە لەبەر ئەوەی دەسەڵاتدارانی بابان بە هیچ شێوەیەك بە بوونی سەربازگەی میرانی بابانی نەیاریان لە کەرکوك‌و یارمەتی دانی والی بەغداو دەسەڵاتدارانی کەرکوك رازی نەبوون، ئەمەش دەبووە هۆی دروست بوونی ئاژاوە لە ناوچەکە لە لایەك‌و هەروەها هۆکارێك بووە بۆ خراپ بوون‌و تێکچوونی پەیوەندی نێوان کەرکوك‌و میرنشینی بابان.

شایەنی باسە لە سەردەمی فەرمانرەوایی (مەحمود پاشا)ی باباندا کێش‌و دەسەڵاتی بابانەکان لە دەڤەری کەرکوکدا کەمتر دەبێتەوە لە چاو سەردەمی (ئەورەحمان پاشا)ی باباندا، ئەمەش بە هۆی ئەو دژایەتییە توندەی کە (داود پاشا) پەیرەوی دەکرد، کە بەردەوام دریخی نەدەکرد لە بەکارهێنانی خاك‌و سەربازانی کەرکوك بۆ دژایەتی کردنی بابانەکان، ئەمە بێجگە لەوەی لەم سەردەمەدا مەترسی ئێرانییەکان لەسەر کەرکوك بە تەواوی زیادی کرد، ئەمەش بە هۆی چاوساغی بابانەکان بۆ لەشکری ئێران. هەر بۆیە لە سەردەمی (مەحمود پاشا)ی باباندا پەیوەندی نێوان کەرکوك‌و میرنشینی بابان رووی لە لاواز بوون کرد، هەروەکو پێشتر روونکراوەتەوە.

ئەوەی جێگەی سەرەنجە کە میرنشینی بابان بە یەکێك لەو میرنشینە کوردییانە دادەنرێت کە زۆرترین کاریگەری‌و پەیوەندی بەسەر دەڤەری کەرکوکەوە هەبووە، هەر بۆیە کاتێك میرنشینی بابان لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا لەناوچوو سەنجەقی سلێمانی کاریگەری ئەوتۆی لە رووی سیاسیەوە لەسەر دەڤەری کەرکوك نامێنێت‌و تەنانەت بە لەناوچوونی میرنشینی بابان مەترسییەکانی ئێرانیش لەسەر ناوچەی کەرکوك نامێنێت، بە جۆرێك لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا هیچ جۆرە دەستدرێژی‌و مەترسیەکی ئێران لەسەر کەرکوك بەدی ناکرێت.

هەروەها پێویستە ئەوە بزانین کە پەیوەندی نێوان بابان‌و کەرکوك هەر تەنها لە چوارچێوەی میرنشینەکەو ئەیالەتی شارەزووردا نەبووە بەڵکو هەندێ جار گەیشتۆتە ئاستی پەیوەندی بنەماڵەی بابان‌و شاری کەرکوك. هەر بۆیە هەندێ جار میرو میرزادەکانی بابان بۆ دوورکەوتنەوە

لە کێشەو هەرای ناو میرنشینەکەیان پەنایان بردووەتە بەر شاری کەرکوک بەمەبەستی نیشتەجێ بوون و دوورکەوتنەوە لە مەترسی بۆ سەر ژیانیان، بەڵام لێرەشدا کێشەیان بۆ کەرکوک دروست کردووە. ئەمەش بە هۆی ئەوەی لایەنگرانی ئەم میرانە بە ئارامی دانەدەنیشتن، وەک ئەوەی لایەنگرانی (محەمەد پاشای کوڕی خالید پاشا)ی بابانی دەستیان کرد بە دەست درێژی کردن بۆ سەر خەڵکی و هەندێ ڕەزو باخیان وێران کرد لە گوندەکانی کەرکوک. هەر بۆیە خەڵکی سکاڵایان بەرزکردەوە بۆ لای موتەسەلیمی کەرکوک[٣٠٣]. بەڵام بە هۆی دووبارە بوونەوەی ئەم جۆرە کارانە سەرەڕای ئەوەی موتەسەلیمی کەرکوک ئاگاداری کردبوونەوە لە دەرەنجامەکەی[٣٠٤]، لە ئاکامدا موتەسەلیمی کەرکوک لە ساڵی (١٨٢٠)ی زایینیدا (محەمەد پاشا)ی بابانی لە سەرای کەرکوک دەستگیرکرد، بەڵام دواتر لایەنگرانی (محەمەد پاشا) بە (٢٠٠) تا (٣٠٠) سوارەوە بە شەو هێرشیان کردە سەر بەندیخانەکەو ئازادیان کرد[٣٠٥]. کاتێک موتەسەلیمی کەرکوک بەم کارەی زانی (خالید پاشا)ی بابان و کوڕە مامەکەی (سلێمان پاشای کوڕی ئیبراهیم پاشا)ی بابانی دەستگیرکرد[٣٠٦]. بەڵام دواتر کە (محەمەد پاشا) لە کارەکانی پەشیمان بۆوە دەسەڵاتدارێتی کەرکوک وەکو مەرج بۆیان دانا کە دەبێت لە دەرەوەی کەرکوک نیشتەجێ بێت[٣٠٧]، ئەوە بوو لە ناوچەی (شوان) لە نزیک کەرکوک نیشتەجێ کرا، بەڵام دوای ئەوەی بەڵێنیان بە موتەسەلیمی کەرکوک دا کە واز لە جوڵانەوەکانیان بهێنن، موتەسەلیمی ناوبراو هەریەک لە خالید پاشاو کوڕە مامەکەی ئازاد کردووو ڕێگەی بە (محەمەد پاشا)ش دا بێتەوە ناو شار نیشتەجێ ببێت[٣٠٨].

### ب. میرنشینی سۆران:

ئەم میرنشینە بە یەکێک لەو میرنشینانە دادەنرێت کە هەر لە کۆنەوە پەیوەندی لەگەڵ ئەیالەتی شارەزووردا هەبووە تەنانەت لە دوا ساڵەکانی سەدەی حەڤدەدا زەوییەکانی ئەم میرنشینە لە ڕووی کارگێڕییەوە سەر بە ئەیالەتی شارەزوور بوونە[٣٠٩].

شایەنی باسە سەرەکیترین پەیوەندی نێوان میرنشینی سۆران و کەرکوک دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (میر محەمەد پاشا)ی سۆران کە بە (پاشای گەورە) ناسراوە، ئەم میرە لە چوارچێوەی فراوانخوازییەکانیدا توانی کاریگەری لەسەر ناوچەی کەرکوک دروست بکات. هاتنی (میر محەمەد) بۆ سەر دەسەڵات لە ساڵی (١٨١٣)ی زایینیدا بە یەکێک لە وەرچەرخانە گرنگەکانی ئەم میرنشینە دەناسرێت ئەمەش بەهۆی فراوانخوازییەکانی میری ناوبراو کە توانی سنووری میرنشینەکەی فراوان بکات[٣١٠]. جێگەی باسە بەشێکی ئەم فراوانخوازییە پەیوەندی بە کەرکوکەوە هەیە کە لەم باسەدا هەوڵ دەدەین ڕوونی بکەینەوە.

دوای دەست بەسەرداگرتنی هەولێر لەلایەن (میر محەمەد)ی سۆران لە ساڵی (١٨٢٣)ی زایینیدا، میری ناوبراو کەوتە هەوڵی فراوانخوازی زیاتر بە تایبەتی چاوی بڕیبووە کەرکوک و ئەو ناوچانەی لە ڕووی جوگرافییەوە سەر بە کەرکوک بوون، هەر بۆیە لە سەرەتادا پەیوەندی بە والی کەرکوکەوە کردووەو هەردوولا ڕێکەوتن بۆ دەست بەسەرداگرتنی خاکی بابانەکان. دواتر پاشای سۆران توانی ڕێکەوتن لەگەڵ سەرکردەکانی پردێدا ببەستێت، دوای ئەمە لە ئاداری (١٨٢٤)ی زایینیدا دەستی بەسەر شارۆچکەکەدا گرت و کارگێڕی خۆی تێدا دابمەزرێنێت[٣١١].

شایەنی ئاماژە پێکردنە بە گوێرەی زانیاری یەکێک لە سەرچاوە مێژووییەکان سەرەتا ئەم ڕێکەوتننامەیە بە شێوەیەکی نهێنی لەنێوان موتەسەلیمی کەرکوک و (میر محەمەد)ی سۆراندا ئیمزاکرا[٣١٢]. دیارە ڕێکەوتنی میری سۆران لەگەڵ موتەسەلیمی کەرکوک ڕۆڵی خۆی هەبوو لە سەرکەوتنی دەستبەسەراگرتنی پردێ لەلایەن میری ناوبراو[٣١٣] هەر بۆیە گرتنی پردێ بەوەرچەرخانێکی گرنگ دادەنرێت لە دەسەڵاتی میرنشینی سۆران لە دەڤەری کەرکوک، ئەمەش یارمەتیدەرێکی باش بوو بۆ میری ناوبراو بۆ ئەوەی بیر لە فراوانخوازی زیاتر بکاتەوە لە ناوچەکەدا بە تایبەتی دەستبەسەراگرتنی شاری کەرکوک تا ئەو کات مەڵبەندی ئەیالەتی شارەزوور بوو، هەر بۆیە (جەلیلی جەلیل) لەم بارەیەوە دەڵێت: "میر محەمەد خەیاڵی گرتنی کەرکوک کەوتە سەری، بەڵام کاتێک ئێران پەلاماری سلێمانیدا، بڕیاری دا لە بەشێ موڵکەکانی بابان بگرێت، والی بەغداش (داود پاشا) بەم سەرکەوتنەی پیرۆزبایی کرد"[٣١٤].

ئەوەی جێگەی سەرەنجە ئەم فراوانخوازییەی (میر محەمەد) بەرانبەر بابانەکان پەیوەندی بە کەرکوکیشەوە هەبوو، هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا کە میری ناوبراو ڕێکەوتنی لەگەڵ موتەسەلیمی کەرکوک هەبووە بۆ یارمەتی دانی بۆ دەستبەسەراگرتنی زەوی بابانەکان، هەر بۆیە موتەسەلیمی کەرکوک یارمەتی (میر محەمەد)ی سۆرانی دا لە داگیرکردنی شاری کۆیەدا، هەرچەندە میری ناوبراو پێشتر نامەی بۆ هەندێ لە گەورەکانی شارەکە ناردبوو[٣١٥].

لێرەدا دەتوانین بڵێین هەرچەندە (میر محەمەد)ی سۆران ڕێکەوتنی لەگەڵ موتەسەلیمی کەرکوکدا هەبووە، بەڵام یارمەتیدانی دەسەڵاتدارانی کەرکوک بۆ میری سۆران پێدەچێت یەکێک بێت لە هەوڵەکانی دەسەڵاتدارانی شاری ناوبراو بۆ دوورخستنەوەی مەترسی (میر محەمەد)ی سۆران لەسەر شارەکەیان و هەوڵدان بۆ گۆڕینی ڕووگەی فراوانخوازییەکانی میری سۆران بۆ بەرەیەکی تر یان هەوڵدان بۆ سەرقاڵکردنی.

جێگەی سەرەنجە ئەم یارمەتیدانەی موتەسەلیمی کەرکوک بە شێوەی جۆراو جۆر ڕاڤەی بۆ کراوە، ئەوەتا گەریدە (میلليگن) کە لە سەدەی نۆزدەدا هاتووەتە ناوچەکە لەم بارەیەوە پێی وابووە دەسەڵاتدارانی کەرکوک ملکەچی (میر محەمەد)ی سۆران بوونە[٣١٦].

لە ڕاستیدا هەرچەندە موتەسەلیمی کەرکوک یارمەتی میری سۆرانی داوەو لە هەندێ لە فراوانخوزییەکاندا هاوکاری بووە، بەڵام میری ناوبراو ڕاستەوخۆ دەستی بەسەر شاری کەرکوکدا نەگرتووە سەرەڕای ئەوەی شارەکە ئەگەری گرتنی لەلایەن میری ناوبراوەوە لەسەر بووە. ئەوەتا گەریدەی

ئینگلیزیش (فرایزەر) کە لە ساڵی (١٨٣٤)ی زایینیدا سەردانی ناوچەکەی کردووە، دەڵێت: "دەسەڵاتی میری سۆران درێژ دەبووەوە لە ڕۆژئاواو باکوردا، لەم کارەشیدا سەرکەوتوو بوو چونکە ئێستا دەستی گرتوە بەسەر بەشی گەورەی باکوری نێوان دوو زێیەکە، ئەمەش درێژ دەبێتەوە لە هەولێر تا کەرکوک لە بەشی ڕۆژهەڵاتی دیجلە"(٣١٧).

سەبارەت بە کاردانەوەی دەسەڵاتدارانی عوسمانی لەبەرانبەر فراوانخوازییەکانی (میر محەمەد)ی سۆران لە ناوچەی کەرکوک‌و هەڵوێستی عوسمانییەکان لە بەرانبەر هەست کردنیان بە مەترسی میری سۆران لەسەر کەرکوک‌و هەروەها یارمەتی دانی والی کەرکوک بۆ میری سۆران، ئەمانە کاریگەرییان بەسەر دەسەڵاتدارانی عوسمانییەوە هەبوو، ئەوەتا والی بەغدا (عەلی ڕەزا پاشا) موتەسەلیمی کەرکوک لادەبات‌و دانانی موتەسەڵیمێکی تر بە ناوی (محەمەد نینجە بەیرەقدار) لە ساڵی (١٨٣٤)ی زایینیدا دادەنێ. شایەنی باسە ئەم کارەی والی بەغدا ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە کەرکوک‌و هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی عوسمانییەوە هەبووە لە ناوچەکە، هەروەها دانانی (محەمەد بەیرەقدار) بۆ ڕێگرتن بوو لە فراوانخوازی‌و کشانی دەسەڵاتی میری سۆران بۆ شاری کەرکوک بەڵام دواتر والی بەغدا لەم کارەیدا سەرکەوتوو نەبوو‌و موتەسەلیمی ناوبراوی گواستەوە بۆ شاری موسڵ لە ساڵی (١٨٣٥)ی زایینیدا، ئەمەش بە هۆی سەنگ‌و دەسەڵاتی میری سۆران‌و خۆشویستنی ئەو میرە لەلایەن خەڵک‌و عەشایرەکانی ناوچەی کەرکوک(٣١٨). شایەنی باسە هەندێکی تر پێیان وایە هۆکاری شکستی دەسەڵاتدارانی بەغدا لەم کارەیان دا دەگەڕێتەوە بۆ نەگونجاوی بارودۆخی کوردستان لەو سەردەمەدا بۆ دانانی والیەکی عوسمانی لە کەرکوک(٣١٩).

هەرچۆنێك بێت ئەم کارەی والی بەغدا بە یەکێك لە دەست تێوەردانەکانی ئەیالەتی بەغدا دادەنرێت لە کاروباری کەرکوک دوای نەمانی دەسەڵاتی مەمالیکەکان‌و گەڕانەوەی دەسەڵاتی ناوەندی بۆ بەغدا لە ساڵی (١٨٣١)ی زایینیدا، هەر بۆیە پەیوەندی نێوان کەرکوک‌و ئەیالەتی بەغدا دوای گەڕانەوەی دەسەڵاتی ناوەندی دیسانەوە لەسەر ئەو بنەمایە بوو کە ئەیالەتی بەغدا لە پەیوەندییەکانیدا لەگەڵ ئەیالەتی شارەزووردا باڵادەست بووە. لە لایەکی تر ئەوەی پەیوەندی بە فراوانخوازییەکانی میری سۆرانەوە هەبووە لە ناوچەی کەرکوک خۆی دەبینییەوە لە بێ هێزی‌و لاوازی دەسەڵاتدارانی کەرکوک لە بەرانبەر ململانێکردن دژ بە میری سۆران لە دەڤەرەکەیان، کە هەر ئەمەش هۆکارێك بوو بۆ دەست تێوەردانی دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە ناوچەکە هەر بۆیە لەم چوارچێوەیەدا دەسەڵاتدارانی بەغدا دواتر سەرکەوتوو بوون لە لەناوبردنی مەترسی (میر محەمەد)ی سۆران لە دەڤەری کەرکوکدا دوای ئەوەی توانیان لە ساڵی (١٨٣٦)ی زایینیدا میری ناوبراو لەناوبەرن(٣٢٠). بەمەش مەترسی میری سۆران لە ناوچەی کەرکوک کۆتایی هات.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە (میر محەمەد)ی سۆران لە درێژەی هەوڵەکانیدا بۆ فراوانکردنی میرنشینەکەی ڕێگەی خۆشکردبوو بۆ ئەوەی بتوانێ دەست بەسەر شاری کەرکوکدا بگرێت‌و بیخاتە سەر ناوچەی دەسەڵاتی، بەڵام دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە ناوچەکەدا بە توندی دژی ئەم هەوڵەی میری ناوبراو بوون‌و هەموو هەوڵێکیان خستەگەڕ لەپێناو سەرنەکەوتنی میری سۆران لە هەوڵەکانیدا. بێگومان هۆکاری ئەمە بێجگە لەوەی دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی لەدەستدانی شاری کەرکوک مەترسی هەبوو بۆ سەر دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە ناوچەکە، ئەمەش بە هۆی ئەوەی شاری کەرکوک مەڵبەندێکی سەربازی گرنگی عوسمانییەکان بوون لە باشووری کوردستان، بەڵام گرتنی شاری ناوبراو لەلایەن میری سۆرانەوە بەو مانایە دەهات کە میری ناوبراو دەسەڵاتی بەسەر بەشی هەرەزۆری باشووری کوردستاندا دەسەپاند.

*** سەرچاوەو پەراوێزەكان:**

١. بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی مێژووی كۆنی كەركوكەوە بڕوانە:
- جمال بابان، (اصول اسماء المدن والمواقع العراقية)، الجزء الاول، مطبعة المجمع العلمي الكردي، بغداد، ١٩٧٦، الصفحة ٢٩٠.
- مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، (كەركوك، ناوی، مێژووی كۆنی، دانیشتووانی، دەسەلاَتەكانی)، چاپی یەكەم، چاپخانەی ئەراپخا، كەركوك، ٢٠٠٦، لاپەرە (٢٥)و دواتر.
- تۆفیق وهبی بگ، (الاثار الكاملة)، إعداد: رفيق صالح، مطبعة شفان، السليمانية، ٢٠٠٦، الصفحات ٢٤٥-٢٥٩.

٢. بۆ زانیاری لەم بارەیەوە بڕوانە:
- جمال رشيد احمد، (كركوك في العصور القديمة)، الطبعة الأولى، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٢، الصفحة ٣٠ ومابعدها.
- تۆفیق وهبي بگ، المصدر السابق، الصفحة ٢٨٤.
- ملا جەمیل ڕۆژبەیانی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٢٨.

٣. حكومة اقليم كردستان- العراق، وزارة التربية- المديرية العامة للاثار، (دليل كركوك بوابة جبال زاگرۆس)، اربيل، ٢٠٠١، الصفحة ٤٣.

٤. بڕوانە:
- الامام ابو الحسن البلاذري، (فتوح البلدان)، دار ومكتبة الهلال، بيروت، ١٩٨٨، الصفحة ٣٢٤.
- الطبري، (تأريخ الأمم والملوك)، تحقيق: محمد ابو الفضل ابراهيم، الجزء الثاني، بيروت، الصفحة ٥٨، الجزء التاسع، الصفحة ١٧٦.

٥. ياقوت الحموي، (معجم البلدان)، المجلد الرابع، بيروت، ١٩٧٩، الصفحة ٤٥٠.

٦. اليزدي، (ظفر نامه)، جلد ١، بتصحيح واهتمام: محمد عباسي، تهران، ١٣٣٦ه.ش، الصفحة ٤٩٦.

٧. لە بارەی ململانێی سەفەوی عوسمانی لەسەر كوردستانو شەڕی چاڵدێرانو هەروەها هەڵوێستی میرو سەرانی كورد بڕوانە:
- سعدي عثمان حسين، (كوردستان والامبراطورية العثمانية، دراسة في تطورها السياسي ١٥١٤-١٨٥١)، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب- جامعة صلاح الدين، اربيل، ١٩٩٥، الصفحة ٢٤ ومابعدها.

٨. بڕوانە:
- هاممەر (فون هاممەر)، (دولت عثمانيه تأريخي)، مترجمي: محمد عطا، الجزء الرابع، كتەئون بترِوسيان مطبعه سى، استانبول، ١٣٣٠، الصفحة ١٥٥.
- محەمەد ئەمین زەكی، (خولاصەیەكی تاریخی كوردو كوردستان)، ئامادەكردنی: ڕەفیق ساڵح، بەرگی چوارەم، بەشی یەكەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، (هەولێر: ٢٠٠٦). لاپەرە ١٢٤.

٩. سەبارەت بە پەیوەندی گرتنی میرانی كورد لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی بڕوانە:
- د. سعدي عثمان، (كوردستان والامبراطورية العثمانية...)، الصفحة ٣٢ ومابعدها.

١٠. ئیالەت: ئەم ناوە لە بنەڕەتدا لە ووشەی (اله)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە، گەورەترین یەكەی كارگێری بوو لە دەوڵەتی عوسمانیدا، دەوڵەت لە چەند ئیالەتێ پێك دەهات، بڕوانە:
- محمد امين العمري، (منهل الاولياء ومشرب الاصفياء من سادات الموصل الحدباء)، حققه ونشره: سعيد الديوەجي، الجزء الثاني، مطبعة الجمهورية، الموصل، ١٩٦٨، الصفحة ٢٥٩.

١١. Uzunçarsili, Ismail Hakki: Osmanil Tarihi, Cilt II, (Ankara: ١٩٩٥), S: ٢٧٥.

١٢. ستیڤن هیمسلي لۆنگریك: (اربعة قرون من تأريخ العراق الحديث)، ترجمة: جعفر الخياط، بيروت، ٢٠٠٤، الصفحة ٣٥.

١٣. د. سعدي عثمان حسين، (كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر، دراسة في علاقتها الإدارية والسياسية والإقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل)، مطبعة سيما، السليمانية، ٢٠٠٦، الصفحة ٧٢.

١٤. بڕوانە:
- عباس العزاوي، (تأريخ العراق بين إحتلالين)، الجزء الرابع، مطبعة شركة التجارة والطباعة المحدودة، بغداد، ١٩٤٩، الصفحات ١٨٢-١٨٣.
- ستیڤن لۆنگریك، (اربعة قرون...)، الصفحة ٦٤.

١٥. شایانی باسە هەموو سەرچاوەكان كۆك نین لەسەر ئەوەی كە ئایا ئەم میرە كوردە كەركوكی داگیركردووە یان سەركردەیەكی تر بوو، لەم بارەیەوە بڕوانە:
- سعدي عثمان، (كوردستان الجنوبية...)، الصفحات ٢٨١-٢٨٩.

١٦. بڕوانە:
- نظمي زاده مرتضى افندي، (گلشن خلفاء)، ترجمة: موسى كاظم نورس، مطبعة الاداب، النجف، ١٩٧١، الصفحة ٢٢١.
- مەستوورەی كوردستانی، (مێژووی ئەردەڵان)، وەرگێڕانی: مامۆستا هەژار، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، لاپەرە ٦٨-٦٩.
- ستیڤن لۆنگریك، (اربعة قرون...)، الصفحة ٦٣.

١٧. عباس العزاوي، (تأريخ العراق بين إحتلالين)، الجزء الرابع، الصفحة ١٨٣-١٨٤.

١٨. ستیڤن لۆنگریك، (اربعة قرون...)، الصفحة ١٨.

١٩. سلێمان بەبە: ئەم میرە لە چارەكی دوایی سەدەی حەڤدەدا فەرمانڕەواییەتی میرنشینی بابانی گرتەدەست، بە یەكێك لە میرە هەرەبەهێزەكانی بابانەكان دادەنرێت كە توانی دەسەلاَتی خۆی بەسەر ناوچەی شارەزووردا بسەپێنێت، هەر

بۆیە لۆنگریك لە بارەی ئەم میرەوە گوتوویەتی: ((ئەم میرە بە دامەزرێنەری راستەقینەی میرنشینەکە دادەنرێت، ئەمە خاوەن کەسایەتییەکی دیارو ناسراو بوو لە شارەزووردا))، بروانە:

– تۆفیق قەفتان، (مێژووی حوکمدارانی بابان لە قەلاچۆلانەوە تا دروست کردنی شاری سلێمانی ١٠٨٠ – ١١٩٩ کۆچی/١٦٩٩ – ١٧٨٤زایینی)، چاپخانەی (سلیمان الاعظمي)، بەغدا، ١٩٦٩، لاپەرە ٣٠–٣١.

– (اربعة قرون...)، الصفحة ١٠٥.

٢٠. تۆفیق قەفتان، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٣٠–٣١.

٢١. بروانە:

– نظمي زاده، المصدر السابق، الصفحة ٢٩٦.

– سعدي عثمان، (كوردستان الجنوبية...)، الصفحات ٢٤٩– ٢٥٠.

٢٢. موتەسەلیم: ووشەیەکی عەرەبیە بە مانای جێگر یان بریکاری والی دێ، بروانە:

– محمد امين العمري، (منهل الاولياء...)، الجزء الثاني، الصفحة ٢٦٣.

٢٣. سعدي عثمان، (كوردستان الجنوبية...)، الصفحة ٢٥٠.

٢٤. بروانە:

– احمد جودت، (تأريخ جودت، از ترتيب جديد)، الجزء الاول، مطبعة عثمانية، استانبول، ١٣٠١ هجري/١٣٠٣ رومي)، الصفحة ٢٨٣.

– ستيڤن لۆنگريك، (اربعة قرون...)، الصفحات ١٠٥–١٠٦.

٢٥. بروانە:

– ستيڤن لۆنگريك، (اربعة قرون...)، الصفحة ١٢١.

– د.جبار قادر، (قضايا كردية...)، الصفحة ١٥.

٢٦. بروانە:

– عبد الرحمن السويدي، (تأريخ بغداد او حديقة الزوراء في سيرة الزوراء)، تحقيق: د.صفا الخلوصي، مطبعة الزعيم، (بغداد: ١٩٦٢)، الصفحات ٢٠–٢١، ٥٤.

٢٧. بروانە:

– لۆنگريك، (اربعة قرون...)، الصفحة ١٦٩.

– سعدي عثمان، (كوردستان الجنوبية...)، الصفحة ١١٧– ١١٩.

٢٨. نادر قولی کە دواتر بە نادرشا ناسرا لە ساڵی ١٦٨٨زدا لە خوراسان لەدایکبووەو سەر بە هۆزی ئەفشارە. نادر قولی توانی کۆتایی بە سەردەمی ئەفغانەکان (١٧٢٢–١٧٣٠ز) لە ئێراندا بهێنێت، دواتر لە ساڵی (١٧٣٦)زدا خۆی کردە شای ئێران، بەڵام بە هۆی زۆری ئەو شەڕو شۆڕانەی ئەنجامیدا وڵاتی ئێرانی تووشی ئاژاوەو کێشەی زۆر کرد تا لە ساڵی ١٧٤٧زدا کوژرا. بۆ زانیاری زیاتر بروانە:

– علاء نورس، (العراق في العهد العثماني – دراسة في علاقتها السياسية ١٧٠٠–١٨٠٠)، بغداد، ١٩٨٩، الصفحات ١٣٧– ١٣٨،

- Lockhart. L. Nadir shah/ A critical study Based Mainly upon contemporary Sources. (London:١٩٣٨).

٢٩. بروانە:

– هامەر، المصدر السابق، الجزء الرابع، الصفحة ٣١٨٨.

– لۆنگريك، (اربعة قرون...)، الصفحة ١٧٠ ومابعدها.

٣٠. بروانە:

– ياسين بن خير الله العمري، (زبدة الاثار الجلية في الحوادث الارضية)، حققه وعلق عليه: د. عماد عبدالسلام رؤوف، مطبعة الاداب، (النجف الاشرف: ١٩٧٤)، الصفحة ٨٩ ومابعدها.

– علي شاكر علي، (تأريخ العراق في العهد العثماني ١٦٣٨– ١٧٥٠م، دراسة في احواله السياسية)، الطبعة الأولى، مطبعة اوفسيت الشعب، نينوى، ١٩٨٥، ص١٨٧ ومابعدها.

– مجموعة من المستشرقين، (الكرد في دائرة المعارف الاسلامية)، ترجمة: حميد ريبوار، منشورات رابطة كاوة، مطبعة اوفسيت هەولێر، اربيل، ١٩٩٩، الصفحة ٧٦.

٣١. بروانە:

– ياسين خيرالله العمري الخطيب الموصلي، (غاية المرام في تأريخ محاسن بغداد دار السلام)، مطبعة دار البصري، بغداد، ١٩٦٨، الصفحات ١٨١–١٨٢.

– محەمەد ئەمین زەکی، (خولاصە...)، بەشی یەکەم، لاپەرە ١٥٤–١٥٥.

٣٢. رسول حاوي الكركوكلي، (دوحة الوزراء في تأريخ وقائع بغداد الزوراء)، ت: موسى كاظم نورس، مطبعة كرم، بيروت، بدون تأريخ، الصفحة ٥٠.

٣٣. (گەشتی دکتۆر ئێڤز بە کوردستاندا لە ساڵی ١٧٥٨ ز)، وەرگێڕان و پەراوێز نووسین: دکتۆر سەعدی عوسمان، گۆڤاری مەتین، ژمارەی (١١٩)، دهۆك، ٢٠٠١، لاپەرە ١١.

٣٤. دوای داگیرکردنی بەغدا لەلایەن شاعەباسی سەفەوییەوە لە (٢٨)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٦٢٣)ی زایینی ناوچەکە بە گشتی و کوردستان بە تایبەتی رووبەڕووی چەندین شاڵاوی گەورەی عوسمانییەکان بوەوە بەمەبەستی گرتنەوەی بەغدا، بە تایبەتی سێ شاڵاوەکەی حافز پاشاو خەسرۆ پاشاو سوڵتان مرادی چوارەمی عوسمانی. ئەم شاڵاوانە کاریگەری گەورەیان بەسەر ناوچە کوردییەکان و کەرکوکەوە هەبوو لە ئاکامدا ناوچەکە رووبەڕووی زیان و کاولکاری بوەوە. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بروانە:

– سعدي عثمان، (كردستان الجنوبية...)، الصفحة ٢٨١ ومابعدها.

٣٥. لە بنەرەتدا مەمالیکەکان ئەو کۆیلانە بوون کە لەسەر دەستی والی بەغدا حەسەن پاشا هێنرانە بەغدا، ئەمانە لە بواری سەربازیدا بەکارهێنران بۆ رووبەڕووبوونەوەی کێشەکان، لە سەردەمی ئەحمەد پاشای کوڕی حەسەن پاشادا هەمان سیستەم پەیرەوکرا لە هێنان و گەشەسەندنی مەمالیکەکان، هەر بۆیە لە سەردەمی پاشای ناوبراودا چالاکی مەمالیکەکان بە شێوەیەکی زۆر پەرەی سەند، دوای مردنی ئەحمەد پاشای والی بەغدا سلێمان پاشای مەمالیك کە یەکێك بوو لە سەرکردە سەربازییەکانی مەمالیك و زاوای والی کۆچکردوو بوو هاتە سەر دەسەڵات وەك یەکەم والی مەمالیکەکان لە بەغدا، لێرەوە سەردەمی فەرمانڕەوایی

مەمالیکەکان لە بەغدا دەستپێدەکات کە تاوەکو ساڵی (١٨٣١)ی زایینی خایاند. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
- د. عماد عبدالسلام رؤوف، (الحياة الاجتماعية...)، الصفحة ٣ ومابعدها.
٣٦. بڕوانە:
- عثمان بن سند الوائلي البصري، (مطالع السعود، تأريخ العراق من سنة (١١٨٨-١٢٤٢ هجري/(١٧٧٤-١٨٢٦ ميلادي)، تحقيق: د.عماد عبدالسلام رؤوف د.سهيلة عبدالمجيد القيسي، مطبعة دار الحكمة للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٩٩، الصفحة ١٥٣.
٣٧. د. عماد عبدالسلام رؤوف، (ادارة العراق الاسر الحاكمة ورجال الادارة والقضاء في العراق في القرون المتأخرة ٦٥٦-١٣٣٧ هجري/١٢٥٨-١٩١٨ ميلادي)، دار الحكمة للطباعة والنشر، (بغداد: ١٩٩٢)، الصفحة ٢٣٦.
٣٨. المصدر السابق، الصفحة ٢٣٦.
٣٩. سعدي عثمان، (كوردستان الجنوبية...)، الصفحات ١١٨-١١٩.
٤٠. (اربعة قرون...)، الصفحة ٢٥١.
٤١. المصدر السابق، الصفحة ٢١٩.
٤٢. عثمان بن سند الوائلي، المصدر السابق، الصفحة ١٠٣.
٤٣. کەریم خان یەکێکە لە کەسایەتییەکانی بنەماڵەی زەندیە کە هۆزی بەناوبانگی کوردەو لە ناوچەکانی نێوان هەمەدان و مەلایەر دەژیان، دوای کوژرانی نادر شا کەریم خانی زەند کە یەکێك بوو لە سەرکردە سەربازییەکانی شای ناوبراو لە ساڵی (١٧٤٩)ی زایینیدا هاتە سەر دەسەڵات. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە:
- جان ر. پێری، (کەریم خانی زەند مێژووی ئێران لەنێوان ساڵانی ١٧٤٧-١٧٧٩)، وەرگێڕان: سەلاحەدین ئاشتی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی ئۆفیستی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥، لاپەرە ٣٨-٤٠.
٤٤. رسول الكركوكلي، المصدر السابق، الصفحة ١٥١.
٤٥. سعدي عثمان، (كوردستان الجنوبية...)، الصفحات ١١٢-١٢٣.
٤٦. رسول الكركولكي، المصدر السابق، الصفحة ١٧٦.
٤٧. عثمان بن سند الوائلي، المصدر السابق، الصفحة ١٥٧.
٤٨. سەبارەت بە پێکهێنانی ویلایەتی شارەزوور و مەڵبەندە بەرایییەکانی بڕوانە:
- خليل علي مراد، (تأريخ العراق الإداري والإقتصادي في العهد العثماني الثاني ١٠٤٨-١١٦٤ هجري/١٦٣٨-١٧٥٠ ميلادي)، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد- كلية الاداب، ١٩٧٥، الصفحات ٦٠-٦٦.
- سعدي عثمان، (كوردستان الجنوبية...)، الصفحات ٩٢-٩٥.
٤٩. لە ساڵی (١٠٠٠ كۆچی/١٥٩١ زایینی)یەوە دەوڵەتی عوسمانی بە فەرمی زاراوەی ئیالەتی لە جیاتیی ویلایەت بەکارهێنا، بەڵام لە ساڵی (١٨٦٤)ی زایینی بەدواوە دووبارە ووشەی ویلایەت هاتەوە کار، لەم بارەیەوە بڕوانە:
- دائرة المعارف الاسلامية (الترجمة العربية)، المجلد الخامس، (مادة ايالة)، خليل اينالجق، الصفحة ٢٦٤.
٥٠. گوڵعەنبەر دەکاتە ناحیەی خورماڵی ئێستا کە (١٠)کم لە هەڵەبجەوە دوورە، بڕوانە:
- عماد عبدالسلام، (ادارة العراق...)، الصفحة ٢٣٦.
- جمال بابان، المصدر السابق، الصفحات ١٦٠-١٦٢.
٥١. سعدي عثمان، (كوردستان الجنوبية...)، الصفحة ١٠٤.
٥٢. عماد عبدالسلام، (ادارة العراق...)، الصفحة ٢٣٦.
٥٣. لەم بارەیەوە بڕوانە:
- ستیڤن لۆنگریك، (اربعة قرون....)، الصفحة ١٢١.
- سعدي عثمان، (كوردستان الجنوبية...)، الصفحات ٩٧-٩٨، ١٠٥-١٠٧.
٥٤. بڕوانە:
- سعدي عثمان، (كوردستان الجنوبية...)، الصفحات ١١٥، ١١٧-١١٨.
- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی کەم بوونەوەی دەسەڵاتی ئیالەتی شارەزوور و هۆکارەکانی بڕوانە:
- د. عماد عبدالسلام، (ادارة العراق...)، الصفحات ٢٣٥-٢٣٦.
٥٥. بڕوانە:
- عثمان بن سند الوائلي، المصدر السابق، الصفحات ١٥٣.
- د. سعدي عثمان، (كوردستان الجنوبية...)، الصفحات ١١٢-١١٣.
٥٦. كارستن نيبور، (رحلة نيبور إلى العراق في القرن الثامن عشر)، ترجمة: د. مەحموود امين حسين، راجعه وعلق عليه ووضع الحاشية: سالم الآلوسي، بغداد، ١٩٦٥، الصفحة ٥٥، ٨٥-٨٦.
٥٧. بڕوانە:
- ستیڤن لۆنگریك، (اربعه قرون...)، الصفحة ٢٥١.
- سعدي عثمان، (كوردستان الجنوبية...)، الصفحة ١١٨-١١٩.
٥٨. بۆ نموونە بڕوانە:
- حسين ناظم بيگ، (تأريخ الإمارة البابانية)، ترجمة: شكر مصطفى ومحمد الملا عبدالكريم المدرس، الطبعة الأولى، مطبعة وزارة التربية، (اربيل: ٢٠٠١)، الصفحات ٢٠٨-٢٠٩.
- عباس العزاوي، (تأريخ العراق بين إحتلالين)، الجزء السادس، الصفحات ١٦٥-١٦٦.
٥٩. بۆ نمونە بڕوانە: رسول الكركوكلي، (المصدر السابق)، الصفحة ٢٣٧.
٦٠. بڕوانە:
- عثمان بن سند الوائلي، المصدر السابق، الصفحة ١٥٣.
- اوليڤيه، (رحلة اوليڤيه إلى العراق ١٧٩٤-١٧٩٦)، ترجمة: د. يوسف حبي، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٨٨، الصفحة ٦٨.
٦١. (رحلتي إلى العراق...)، الصفحة ١٤٦.
٦٢. بڕوانە:
- آ. دوبري، (رحلة إلى فارس خلال سنوات ١٨٠٦-١٨٠٨)، باريس، ١٨١٩، الصفحة ١٣٢، نقلا عن:
- د. هلكوت حكيم، (كركوك في كتابات الرحالة الفرنسيين)،

*** كەركوك لە بەڵگەنامەكانى عوسمانيدا:-**

**د. عيماد عەبدولسەلام**
**و. ئەنجام سەعيد**

ئەو بەڵگەنامانەى كە پارێزراون لە ئەرشيفى عوسمانى لە ئيستانبوڵ زانيارى ورد ئاشكرا دەكەن، دەربارەى مێژووى يەكە كارگێرييەكان و پێكهاتەى دەوڵەتى عوسمانى، ئەمەش تاكە سەرچاوەيە كە لێكۆڵەران ناتوانن بەبێ ئەم سەرچاوانە وێنايەكى نزيك لەسەر رەوشى ژيانى كارگێريى و دارايى و سەربازيى شار و شارۆچكەكان و قەڵا و گوندەكان و هۆز و سەرۆكە خۆجييەكانى ئەو هەرێمانە لە سەدەكانى كۆتايى بخەنە روو.

كەركوك بەپێى ئەو پەرتووكانە يەكێك لە ليواكانى شارەزوور بووە، كە (ليوا)ش لە زاراوەى عوسمانيدا (پارێزگا) دەكات.

فەرمانرەواى هەر پارێزگايەك نازناوى (مير)ى هەڵگرتووە، بەڵام سەرۆكى گشتى پارێزگاكان نازناوى (ميرى ميران)ى هەڵگرتووە و هەموو ئەو پارێزگايانەش سەر بە ناوەندى (گوڵ عەمبەر) بوونە، واتە (خورماڵ)ە ئێستا، وشەى (كول) ماناى (شهرزول)ە و لە (شارەزوور)ەوە وەريانگێراوە، ئەويش ناوێكى زۆر باو و بڵاو بووە لە بەڵگەنامە عوسمانييەكان و بەردەوامى كارى پێكراوە لەم يەكە ئيدارييە گەورانەدا.

واديارە سەختى رێگە و كەش و هەوا ساردەكەى گوڵ عەمبەر هۆكارێك بووە بۆ ئەوەى هەندێك لە ميرەكانى پارێزگاى شەهرەزوول، شارى كەركوك بكەن بە بارەگا و ناوەندێك بۆ حكوومەتەكەيان لەبرى كوڵ عەمبەر و سەرجەم هێزەكانيان بگوازنەوە ئەو شارە، بەڵام دەسەڵاتدارانى عوسمانى بەم گواستنەوەيە رازى نەبوون، چونكە (گوڵ عەمبەر) شوێنێكى گرنگ و ناوەندێكى چاودێريى و هەواڵگرى عوسمانى بوو بەسەر وڵاتى ئێرانەوە.

هەر وەك لەو بەڵگەنامەيەى لە ١١ى بەهارى دووەمى ساڵى ٩٧١ى كۆچى - ١٥٦٣زايينى، كە فەرمانێكى ئاراستە كراو بۆ ميرى ميرانى شارەزوور ئاشكرا دەكات و تێيدا هاتووە، سوڵتان ئاگادارە كە ميرى ميران لە كەركوك نيشتەجێ بووە، بۆيە فەرمانى پێدەكات بە گەرانەوەى هەموو هێز و يەكە سەربازييەكانى بەبێ دواكەوتن بۆ شارەزوور (واتا بۆ ناوەندى پارێزگاى گوڵ عەمبەر).

واديارە ميرەكانى شارەزوور تا توانيويانە سوور بوونە لەسەر نيشتەجێبوونيان لە كەركوك، سەرەراى فەرمانى جەنابى سوڵتان بۆ گەرانەوە بۆ گوڵ عەمبەر. دەبينين پاش نزيكەى بيست ساڵ بەسەر دەرچوونى بريارەكەى سوڵتان لە بەڵگەنامەيەكدا كە لە ٦ى موحەرەمى ساڵى ٩٩١ى كۆچى-١٥٨٢ى زايينى دووبارە (مير)ى شارەزوور داوايەكى ئاراستەى ميرى ميرانى كردووە بەڵكو لە رێگەى ئەوەوە (سوڵتان) رەزامەندى پێبدات لە كەركوك نيشتەجێى بكاتەوە بەهۆى خراپى كەش و هەواى شارەزوور.

بێگومان لە كۆتاييدا ئەم خواستە بەردەوامەى ميرەكانى شارەزوور بۆ نيشتەجێبوون لە كەركوك وايكرد ئەم شارە بكرێتە تاكە ناوەندى دەسەڵاتى عوسمانى و لەدەستدانى گرنگييەكانى گوڵ عەمبەر كە وێستگەى هەواڵگرى عوسمانى بوو.

لە بەڵگەنامەى ٢٩ى زى حيجەى ساڵى ٩٨١ى كۆچى- ١٥٧٣زايينى دەردەكەوێت كە سەرجەم زەوى و خانووبەرەكانى كەركوك لە پەرتووكێكى تايبەت تۆمار كراوە پێى دەڵێن (پەرتووكى دێرين)، ئەويش دوو جۆر موڵكدارێتى لەخۆ دەگرێت:- ئەرزە و خانووبەرە فەرمييەكان پێيدەوترا (مير)ى، ئەوەى هى هاووڵاتيان بووە پێيانوتووە (تايبەت)، ئەم جۆرە پەرتووكانەش تۆمارى گشتى بووە و لە سەردەمى سوڵتان (سلێمان قانوونى) ئەنجامدراوە و تايبەت بووە بە جەنابى سوڵتان، بەراورد بەو تۆمارانەى دواتر ئەنجادراوە.

لە نووسراوێكى ميرى ميرانى شارەزوول (حەسەن پاشا) كە گەيشتووەتە جەنابى سوڵتان لە رێگەى ميرى ميرانى بەغداوە، تێيدا هاتووە گوايە لە شارى كەركوك تەلارێك هەيە لە هەردوو تۆمارى (ميرى) و تۆمارى (تايبەت) نووسراوە، هەروەها تەلارێكى تريش هەيە لە هيچ شوێنێك تۆمار نەكراوە، بۆيە داوا دەكات بە دەركردنى بريارێكى دادوەرانە بۆ ئەو مەبەستە، جەنابى سوڵتانيش بريارى داوە بە ئەنجامدانى لێكۆڵينەوەيەك و پاش ئەوەى دەركەوت موڵكى تايبەت نييە ياخود بەندكراو نييە بۆ هيچ لايەنێك ئەوكات لە بەشى (ميرى) تۆمار بكرێت.

كەركوك خاوەنى دادوەرى تايبەتى خۆى بووە، چونكە ناوچەيەكى سەربەخۆ بووە، بەڵگەنامە عوسمانييەكانيش ئاماژە بە گرنگى شوێنەكەى دەكەن لە سەرجەم بوارەكانى ژياندا.

لە بەڵگەنامەى رۆژى ٢٤ى شەعبانى ساڵى ٩٨٣ى كۆچى - ١٥٧٥ى زايينى دەبينين كە نووسراوێكى ميرەكانى (شەهرەزوول و دادوەرى مووسڵ و كەركوك)ە تێيدا سوڵتان ئاگادار دەكەنەوە بە ياخيبوونى هەر يەك لە (يەزدان قەلى و حەيدەر و محەمەد يونس)، هەروەها دەستگيراوە بەسەر قاسم و يەزدان بەهۆى ساغبوونەوەى تاوان بەسەرياندا، بەڵام لەبەر ئەوەى سەر بە هێزە سواچاكەكانى (سباهيە)ن ئازاد كراون و لەژێر چاودێريى تووندا نێردراون بۆ ئيستانبوڵ.

ئەمەش لەو بەڵگەنامەيەى كە لە ١٢ى رەمەزانى ساڵى ٩٨٥ى كۆچى - ١٥٧٧ى زايينى، كە نووسراوێكە لەلايەن دادوەرى كەركوكەوە ئاراستەى سوڵتان كراوە و ناوى كۆمەڵێك كەسايەتى تێدايە كە دانيشتووى گوندى (عەرەب كندى)ين، ئەوانيش هەر يەك لە (فەرەج، نەسرەدين، عەبدولحوسێن، عەلى عەبدولعەلى، رەجەب شەهاب، حوسێن)، گوايە هەر لەوەتەى ئيسماعيل شا هاتووەتە سەر تەخت لە ئێران ئەم كەسايەتييانە كۆبوونەوەى داخراو دەبەستن و تەنانەت ژنانيش بەشدار دەكەن، بۆيە لە نووسراوەكەدا هاتووە لێكۆڵينەوەيان لەگەڵدا بكرێت و ئيستانبوڵ لە ئەنجامەكەى ئاگادار بكەنەوە.

هەروەها لە بەڵگەنامەی ١٨ی رەجەبی ساڵی ٩٩٠ی کۆچی-١٥٨١ی زایینی دادوەری کەرکوک نامەیەکی بۆ سولتان ناردووە، ئاگاداری دەکاتەوە کە ناوبراو خوداوەردی کەسێکی ئاژاوەچی و گەندەڵکارە و داوا دەکات لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکرێت و ئیستانبوڵ ئاگادار بکرێتەوە، کەواتە ئەوەی لە هەردوو بەڵگەنامەکە تێدەگەین ئەوەیە، کە هەندێک لە دادوەرەکانی کەرکوک سەرپشک بوونە و پەیوەندی راستەوخۆیان لەگەڵ سولتاندا هەبووە و سەرجەم پایە و پلەکان تێپەڕاندووە.

هەروەها لە بەڵگەنامەکان ئەوە تێدەگەین کە زەوی و زاری کەرکوک بەپێی سیستەمی دەرەبەگی سەربازی عوسمانی پۆلێن کراوە بۆ سێ جۆر ئەوانیش وەک (خواص همایون) زۆر دووبارە دەبێتەوە بۆ سوڵتانە عوسمانییەکان، هەروەها (زعامە) ئاماژەیە بۆ ناوچەیەکی بچووکتر تایبەتە بە ئەفسەرە عوسمانییە پلە باڵاکان وە (تیمار) ئەو ناوچانەیە بە ئەفسەرە پلە نزمەکان و سەرۆک هۆزەکان دەبەخشرا.

میری میران بەرپرس بوو لە جێگیرکردن و پارێزگاری و چاودێریی ئەو سیستەمەی کە لە ناوچەکە پەیرەو دەکرا، چونکە پەیوەندی هەبوو بە لایەنی سەربازییەوە و ئەو باجانەی وەردەگیرا پاشان دەکرا بە مووچە بۆ سەربازەکان و جەنگاوەرەکانی ناوچەی (السباهیە)، هەورەها بەڕێوەبردنی ناوچەکانی (خواص همایۆن) دەدرایە دەست سەرۆک هۆزەکان، چونکە ئەوان بە تواناتر بوون لە بەڕێوەبردنی بەرامبەر بە بڕێ پارەی دیاریکراو کە ئەویش دەخرایە سەر خەزێنەی شەهرەزوول پاشان بۆ گەنجینەی گشتی دەوڵەت.

(سەهرانی حوسێن بەگ) بەناوبانگترین ئەو سەرۆک هۆزانە بوو کە یەکێک بوو لە میرەکانی سۆران.

بەڵگەنامە عوسمانییەکان هیچ ئاماژەیەک بە میرەکانی شاری کەرکوک ناکات، بەڵکو تەنها ئاماژە بە کەسێک دەکات بە ناوی (ئالی بەگ) کە پلەیەکی سەربازیی هەبووە بۆ ئیدارەدانی کەرکوک ئەویش لەلایەن میری میرانی شارەزوور ئەو پۆستەی پێبەخشراوە.

پاش ماوەیەکی تر و لە بەڵگەنامەی ١٥ی زی حیجەی ساڵی ٩٨٦ی کۆچی- ١٥٧٨ی زایینی، نووسراوێک لەلایەن میری میرانی شارەزوورەوە دەرچووە دووپاتی دەکاتەوە کە (ئالی بەگ) کۆچی دوایی کردووە و داوا دەکات ئەو پۆستە بدرێت بە (رەمەزان سەرحەد) بۆ بەڕێوەبردنی لیوای کەرکوک.

کەرکوک و هەولێر دوای (گول عەمبەر) دوو ناوەندی سەرەکیی ناوچەی شەهرەزوور بوونە، لە رێگەی ئەم دوو شارەوە هاوکاری و خۆراک دەنێردرا بۆ سەربازگە سنوورییەکان لە فەرمانێکدا کە لە ١٦ی رەمەزانی ساڵی ٩٨٨ی کۆچی-١٥٨٠ی زایینی ئاراستەی میری میرانی شەهرەزوول کراوە و دەڵێت: کە عەمبارە میرییەکان، واتە گەنجینە حکومییەکان لە قەڵای (کولفاد) بەتاڵ بوون و دەبێ بەزووترین کات خۆراک بۆ ئەو سەربازگانە لە رێگەی هەردوو شارەکانی (کەرکوک و هەولێر)ەوە دابین بکرێت.

بەڵگەنامە عوسمانییەکانی سەدەی هەژدەهەم، گرنگی کەرکوک لەلای گەورە بەرپرسانی عوسمانییەکان ئاشکرا دەکات، کە شار گرنگییەکی زیاتری پێدراوە بەراورد بە بەڵگەنامەکانی سەدەی پێشووتر، گرنگی شوێنە ئیستراتیجییەکەی شاری کەرکوک وەک وێستگەیەکی سەرەکی و زاڵ بەسەر رێگە مێژووییەکەی شەهرەزووردا لە شەڕو ناکۆکییە بەردەوامەکانی (عوسمانی و ئێرانی)یەکان دەردەکەوێت، کە هەر لەوێشەوە بڕیار لەسەر چارەنووسی هەولێر و مووسڵ و وڵاتانی کەنداو دراوە.

دیارە پاسەوانیکردنی کەرکوک و بەهێزکردنی ئامانجی سەرەکی و ئەرکی بەرپرسەکان بووە هەر وەک ئاماژە کراوە بە قەڵای کەرکوک لە بەڵگەنامەی مانگی موحەرەمی ساڵی ١١٢٤ی کۆچی کە فەرمانێکی رەزامەندی سوڵتان ئاراستەی دادوەری کەرکوک کراوە و تایبەتە بە نۆژەنکردنەوەی ئەو خانووانەی پشتیان بە دیواری کەرکوکەوەیە، چونکە نۆژەنکردنەوەیان دەبێتە مایەی بەهێزکردنی دیوارەکانی قەڵای شارەکە، سەبارەت بەو داوایەی کە لەلایەن خاوەنماڵەکانەوە ئاراستەی کراوە.

هەروەها بەڵگەنامەکە سەرنجی خوێنەر بەلای کۆمەڵێ شتی ترەوە رادەکێشێت ئەویش کە دەسەڵاتی تەواو بە دادوەری کەرکوک دراوە هەر لە بیناسازی و نۆژەنکردنەوەی زۆرترین خانووبەرە بۆ دانیشتووان، لەلایەکی تریشەوە رەزامەندی راستەوخۆی سوڵتان دەربارەی داوای خاوەن ماڵەکان بۆ نۆژەنکردنەوەی ماڵەکانیان لەسەر ئەرکی دەوڵەتی عوسمانی، کە سەرەنجام ئەو نۆژەنکردنەوەیە دەبێتە بەهێزکردنی قەڵای کەرکوک بۆ پاراستنی دانیشتووانەکەی لە دەستی دوژمنان.

گرنگی پێدانی دەوڵەتی عوسمانی تەنها بە کەرکوک و قەڵاکەیەوە نەبووە، بەڵکو باڵی کێشاوە بەسەر لادێیەکانیشییەوە، دەبینین پاش ئەوەی دەرکەوت لادێیەکانی کەرکوک لە کەمی هێزی کار دەناڵێنێت، فەرمانێک لە سوڵتانەوە بۆ والی بەغدا (حەسەن پاشا) دەرچووە داوای لێدەکات بە نیشتەجێکردنی چەند هۆز و عەشرەتێک لەنێوان کەرکوک و هەولێر بۆ چاودێری و پارێزگاریی پردی ئاڵتوون کۆپری و زەمینەیان بۆ سازبکەن بۆ کاری کشتوکاڵی بۆ بەرەو پێشبردنی ناوچەکە.

پاش هاتنی نەجم نادر خان ناسراو بە (بتهماسب قولی خان) دوایین سوڵتانی دەوڵەتی سەفەوی بۆ سەر تەختی دەسەڵات لە وڵاتی ئێران و ئاشکرابوونی نییەتی سەربازی بۆ فراوانکردنەوەی تەخت دەسەڵاتی لە ناوچەکە رووەو عێراق و کوردستان، گرنگی کەرکوک زیادیکرد، کاتێک نادر خان پێشرەوی کرد بەرەو ناوچەی کرمانشاه و نزیکبووەوە لە سنوورەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە عێراق و کوردستان، بەرپرسە عوسمانییەکان ترسی هێرشکردنی (نارد خان)یان لێنیشت، بۆیە بەپێی ئەو هەواڵانەی بە سوڵتان گەیشت بوو فەرمانێکی بۆ (ئەحمەد پاشا) والی بەغدا دەرکرد. داوای لێدەکات لە حاڵەتی ئامادەباشیدا بن بۆ بەهێزکردنی ناوچەی کەرکوک نەوەک (تەهماسب قولی خانی ئێران)ی هێرشیان بکاتە سەر شارەکە.

هەرچەندە سەرکردایەتی گشتی هێزە عوسمانییەکان

سپێردرابووە والی (دیاربەکر)، بەڵام سەرجەمی سەرکردە ناوخۆییەکان لە نەتەوەی کوردبوون، هەروەك لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە، کە دەتوانرێت سوود لە(خالید پاشا) فەرمانڕەوای لیوای بابان و (مەحموود پاشا) فەرمانڕەوای لیوای کۆیە وەربگیرێت بۆ بەهێزکردنی ناوچەکە.

بۆیە لە ساڵی ١١٤٥ی کۆچی-١٧٣٢ی زایینی ترسی سەرکردایەتی هاتە دی، کاتێك لەشکرەکەی نادرخان واتە (تەهماسب قولی خان) دەورووبەری بەغدای گەمارۆداوە لە هەمان کاتدا هێزێکی تریش بەرەو کەرکوك پێشڕەوییان کردووە بە رابەرایەتی (نەرجس خان) سەرەنجام دێهاتەکانیان وێرانکردووە، لە بەڵگەنامەیەکی تردا کە نامەیەکە ئاراستەی میر و وەزیرەکانی مووسڵ کراوە، تێیدا هاتووە کە (تەهماسب قولی خان) بە هێزێکی زۆرەوە رووەو بەغدا رۆیشتووە، بەڵام تێکشکاوە و بۆیە گەڕاوەتەوە و کەرکوکی گەمارۆداوە. بەو هۆیەوە جەنگێك لە کەرکوك هەڵگیرساوە، تەنانەت ناوچەی دوجێلیشی گرتووەتەوە لەوێدا عوسمان پاشا سەرکەوت و پاشان گەمارۆدانەکەی بەغداشی شکاند، بەڵام نادر شا دووبارە هێرشی کردەوە سەر عوسمان پاشا و ئەمجارەیان توانی سەربکەوێت و جەنگەکەش تا ناوچەی بازیان گەیشت و ناونرا (رووداوەکەی کەرکوك) چونکە ئامانجی ئەو پرۆسەیە قوتار کردنی کەرکوك بوو لە وێرانکاری.

هەروەها بەڵگەنامەکان بەشداریکردنی هێزە میسرییەکان لەو جەنگەدا ئاشکرا دەکەن، سەبارەت بە فەرمانێکی عوسمانی کە ئاراستەی (عەبدوڵلا پاشا)یان کردووە بە مەبەستی ناردنی هێزی میسری بۆ بەهاناهاتنی عوسمانییەکان لە جەنگە ناوبراوەکەی (رووداوی کەرکوك).

میسرییەکانیش خێرا بەدەنگی ئەو فەرمانەوە هاتوون بە مەبەستی خزمەتکردنی ئایینی ئیسلام، دەوڵەتی عوسمانیش رێزێکی زۆری لێگرتوون و پلە و پایەی پێبەخشیون.

دیارە هەموو ئەوەی لە کەرکوك روویداوە سەرکردایەتی عوسمانی ماندوو کردووە، بۆیە لە بەڵگەنامەیەك کە لە ساڵی ١١٤٧ی کۆچی-١٢٧٣ی زایینی دەبینین ئامادەکارییەکی زۆر کراوە بۆ چاودێریکردنی کەرکوك، لە فەرمانێکدا کە ئاراستەی (عومەر ئەبو بەکر پاشا زادە) کراوە، سەبارەت بە دامەزراندنی وەك پارێزگاری شارەزوور بە مەرجی ئەوەی پاسەوانێتی قەڵای کەرکوك بگرێتە ئەستۆ. هەر لە هەمان ساڵدا فەرمانێکی دیکە ئاراستەی (سەلیم پاشا) کراوە بە هەمان بابەت و هەمان مەرج واتە پاسەوانێتی قەڵای کەرکوك.

دیسانەوە و پاش دەیەك نادر پاشا هێرشی کردووەتەوە سەر شارەکانی بەغدا و بەسرە و مووسڵ واتە ساڵی ١١٥٧ی کۆچی-١٧٣٤ی زایینی ئەمجارەیان کەرکوکی کردە ئامانج و وێرانکاری بەسەردا هێنا، هەر لە کۆتایی ئەو ساڵەدا سوڵتان فەرمانێکی ئاراستەی (حوسێن پاشا)ی میری میرانی شەهرەزوور کردووە، داوای لێدەکات پارێزگاری لە قەڵای کەرکوك بکات.

نادر شا بە پێشڕەوی دوو سەد هەزار سەرباز گەمارۆی شاری مووسڵیدا، پاشان رووە و کەرکوك بەرێککەوت و گەمارۆدانەکە (٦٠)رۆژی خایاند.

بەڵگەنامەکان نهێنی خیانەتی ناوخۆیی بەشێك لە هێزە عوسمانییەکان ئاشکرا دەکات، کە بووەتە هۆی رووخانی کەرکوك، بۆیە فەرمانکراوە بە (ئەحمەد پاشا)ی پارێزگاری بەغدا، کە سەرزەنشتی توندی هەندێ لەو یەکە سەربازییانە بکات کە پاسەوانێتی قەڵای کەرکوك و هەولێر دەکەن، بەهۆی خەیانەتیان لە ئاین و دەوڵەتی عوسمانی لە کاتی هێرشی (نادر شا) بۆ سەر شارە عێراقییەکان.

کەرکوك تا کۆتایی سەدەی دوانزەهەمی کۆچی (هەژدەهەمی زایینی) سەنتەری ناوچەی شەهرەزوور بووە، هەروەك لە بەڵگەنامە عوسمانییەکاندا هاتووە، بەڵام لە سەرچاوە لۆکاڵییەکاندا ناوچەی شەهرەزووریان بە کەرکوك ناوبردووە.

لە ساڵی ١١٩٠ی کۆچی - ١٧٧٦ی زایینی سوڵتان داواکارییەکی پارێزگاری بەغدا (حەمە پاشا) رەتدەکاتەوە سەبارەت بە لکاندنی شەهرەزوور بە بەغداوە، بەڵام دەبینین دواتر لە ساڵی ١١٩٠ی کۆچی رەزامەندی خۆی بۆ داواکارییەکەی دەربڕیوە و شارەزووری لکاندووە بە بەغداوە و پارێزگاری بەغداش فەرمانبەری تایبەتی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری شەهرەزوور دامەزراندووە، هەرچەندە ناوی ئەو فەرمانبەرانە لە سەرچاوە فەرمییەکاندا ئاشکرا نەکراوە.

*** بارودۆخی سیاسیی کەرکوك لە سەردەمی پاشایەتیدا (١٩٢١ - ١٩٥٨):-**

**د. دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان**

*** مێژووی سیاسیی کەرکوك لە سەردەمی پاشایەتیدا:**

کەرکوك[١] وەك زۆربەی شارەکانی دیکەی ویلایەتەکانی عێراق: (بەسرە، بەغداد، موسڵ)، لە ئاکامی ئۆپراسیۆنە سەربازییەکانی وڵاتانی هاوپەیمان لە جەنگی یەکەمی جیهانی، لە (٢٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٨)دا، کەوتە نێو بازنەی دەسەڵاتی بەریتانیاوە[٢]. ئەوەش خاڵی وەرچەخانی کاریگەر بوو لە مێژووی شارەکە، چونکە ئەو شارە نزیکەی چوار سەد ساڵ، (لە نیوەی سەدەی شانزەهەم تا کۆتاییەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی)، لە ژێر سایەو کۆنترۆڵی دەوڵەتی عوسمانیدا بوو.

ئینگلیزەکان بە مەبەستی قایمکردنی دەسەڵاتیان و زەمینەسازی لەپێناو یەکخستنی ناوچە جیاوازەکانی عێراق، ڕاستەوخۆ لەلایەن ئەفسەرانی سەربازییەوە کەوتنە هەڵسوڕاندنی کاروباری ناوچەی کەرکوك[٣]. پەیڕەوکردن لەم سیاسەتە لە سەروبەندی (کۆنگرەی قاهیرە)ش[٤] (١٢-٢٤)ی ئاداری ساڵی (١٩٢١) لەلایەن (سێر پێرسی کۆکس) (*Sir Percy Cox*) (سەرۆکی شاندی عێراق لە کۆنگرەی قاهیرە) جەختی لەسەر کرایەوەو سەلمێندرا[٥]. بۆیە کاتێك مەسەلەی دروستکردنی دەوڵەتی عێراق هاتە گۆڕێ، کەرکوك و ناوچە کوردییەکانی خوارووی کوردستان لە ڕاستیدا ڕاستەوخۆ نەخرانە ژێر کۆنترۆڵی دەسەڵاتدارانی ئەو دەوڵەتە[٦].

بێ هۆ نەبوو کە ئینگلیزەکان ئەو چەشنە سیاسەتەیان گرتەبەر، پەرەسەندنە سیاسییەکانی دواتر، ڕوون و ئاشکرا دروستی بۆچوونەکانی دەسەڵاتدارانی ئینگلیزیان پشتراستکردەوە، بە تایبەت کاتێك بەریتانییەکان لە (تەمووزی ساڵی ١٩٢١)دا، ڕاپرسییەکیان بە مەبەستی کاندیدکردنی (فەیسەڵ کوڕی حوسێن) (١٨٨٥-١٩٣٣)، بۆ تەختی پاشایەتی عێراق ئەنجامدا، لیوای کەرکوك لەو ڕاپرسییەدا بە زۆرینەی دەنگ، لە دژی کاندیدکردنی (فەیسەڵ کوڕی حوسێن) وەستان. چونکە ئەمان دەسەڵاتدارێکی عەرەبیان نەدەویست[٧]، بەڵکو تورکمانەکانی شار خوازیاری دانانی کەسێکی تورك بوون[٨]، کە کەمالییەکانیش هەمان نیازیان هەبوو[٩]. کوردەکانیش دامەزراندنی حکومەتی کوردیان داوا دەکرد[١٠]. واتە ئەمە بەو مانایە دێت کە ئەم ناوچەیە ئەوە ڕەتدەکاتەوە بخرێتە ژێر کۆنترۆڵی عەرەب. لە ڕاستییدا، بەشێك لە توێژی سەرووی کۆمەڵە دانیشتووانی کوردی کەرکوك خوازیاربوون دەسەڵاتی تورکەکان بگەڕێتەوەو لەو پێناوەشدا شانبەشانی دەستڕۆیشتووەکانی تورکمان لە هەوڵی هێنانەدی مەبەستەکەیاندا بوون. لەنێو ئەوانەدا بەرزەنجییەکان بە تایبەت کەسایەتی بەناوبانگی کەرکوك (سەید ئەحمەدی خانەقا) لە نموونەو بەڵگەی دروستی ئەم ڕاستییەن.

سیاسەتی ئینگلیزەکان لە قۆناغی داگیرکاری (١٩١٨-١٩٢٠)و ساڵانی ئینتیدابدا (١٩٢٠-١٩٣٢)، بریتیبوو لە بەهێزکردن و پشتگیریکردنی بەرژەوەندی سەرۆك هۆزو شێخە بە دەسەڵاتەکان. دەیانویست لە ڕێگەی پێگەی ئەوانەوە دەسەڵاتیان بسەپێنن بەسەر شارو ناوچەکاندا[١١]. هەر لەو پێناوەدا گرنگی تایبەتیان بە چەند دەستەو تاقمێك دا.

بارودۆخی شاری کەرکوك، لە چوارچێوەیەکی گشتیدا، لەگەڵ هاتنی ئینگلیزەکان بۆ ناوچەکە، گۆڕانکاری زۆری بەخۆوە گرت. ڕەنگە لە دیارترین ئەو گۆڕانانە بە بنکەکردنی شاری کەرکوك بێت لە ڕووی سەربازییەوە. بەریتانیا دوای ئەوەی توانی کەرکوك بخاتە ژێر دەستی خۆیەوە، چەندان یەکەی سەربازیی لەم ناوچەیە مۆڵدا. بەپێی ڕاپۆرتێکی هاوبەشی لێژنە سیاسی و سەربازییەکانی بەریتانی، ژمارەی یەکە سەربازییە جێگیرکراوەکانی بەریتانیا لە ناوچەکەدا بریتیبووە لە بیست و سێ یەکەی سەربازی[١٢].

هەوڵی لێبڕاوانەی ئینگلیزەکان بۆ ئەوە بوو کە ناوچەکانی کەرکوك و مووسڵیان لە دەست دەرنەچێت، کە دەوڵەمەندن بە نەوت و بۆ بەرژەوەندییە ستراتیژی و سیاسییەکانی بەریتانیا گرنگن. بۆیە بە هەموو شێوەیەك لە هەوڵدا بوون بۆ هێشتنەوەی ئەو ناوچانە لە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە دەکرێ ئاماژە بەو هێزە بکرێت کە ئینگلیزەکان پاش کۆتاییهاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی دروستیانکرد بەنێوی (هێزی باشووری کوردستان)و مەڵبەندەکەی لە شاری کەرکوك داندرا[١٣]. ئیتر بەو جۆرە شاری کەرکوك وەك مەڵبەندێکی سیاسی و سەربازیی بەریتانیا مامەڵەی لەتەك کرا.

دوای دروستکردنی دەوڵەتی عێراقیش، ئینگلیزەکان لەسەر ئەو سیاسەتەیان بەردەوامبوون. هەمیشە بەرپەرچی هەموو هەنگاوو هەڵوێستێکی نەخوازراویان دەدایەوە کە لە پاشەڕۆژدا ئەم مەرامەیان پووچەڵ بکاتەوە. بۆ نموونە سەرکوتکردنی جموجۆڵە نەتەوەییەکانی کورد بە ڕابەرایەتی (شێخ مەحموودی بەرزنجی) (١٨٨٤-١٩٥٦) لە چوارچێوەی ئەم نیازە ناترازێت[١٤]. بەریتانییەکان هەمیشە لە کەرکوکەوە فەرمانی لەشکرکێشیان دەرکردووە بۆ سەر ناوچە کوردییەکان. لەمەوە ڕووندەبێتەوە کە شاری کەرکوك نێوەندێکی سەربازیی گرنگ بووە بۆ مانەوەو پارێزگاریکردنی بەرژەوەندییەکانی ئینگلیز لە ناوچەکەدا.

دەسەڵاتدارانی عێراق لە دوای سەربەخۆبوونی عێراق (١٩٣٢)، بە هەمان ڕێبازو سیاسەتی ئینگلیزەکان شاری کەرکوکیان کردە مەڵبەندی سەربازیی و هێرشبردن بۆ سەر بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کوردی لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا[١٥].

هەر چەندە شاری کەرکوك لە ڕووی کارگێڕیی و بەڕێوەبردنەوە سەر بە حکومەتەکانی عێراق بوو، بەڵام تا ساڵانی (١٩٢٤-١٩٢٥) بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە نەچووە

پاڵ دەوڵەتی عێراق. ئەم شارە کە مەڵبەندی پشتیوانخوازیی دەسەڵاتی تورکە عوسمانییەکان بوو، ڕقو کینەیان بەرانبەر بە ئینگلیز هەبوو، ئیدی بۆ گوزارشتکردنو پیشاندانی ڕق ئەستووریان بەرانبەر بە ئینگلیزو دەستو پێوەندەکانیان، بەردەوام باسیان لە سەرکەوتنەکانی کەمالیان دەکرد بەسەر یۆناندا. ئەو ڕۆژگارە، چونکە ئینگلیزەکان بە باسی لەو جۆرە تەواو نیگەران دەبوون، هەرچی باسی ئەو سەرکەوتنانەی بکردایە، حسێبی نیشتمانپەروەری بۆ دەکرا لەنێو دانیشتووانی شاری کەرکوکو[١٦] لە کۆڕو دانیشتنە تایبەتییەکانیشدا ناوی بە ڕێزەوە دەبردرا.

لە لایەکی دیکە، کەرکوک لە ساڵانی ئینتیدابدا (١٩٢٠-١٩٣٢)، جموجۆڵێکی سیاسیی ڕێکخراوەیی بەخۆوە گرتو ڕێکخراوی خاوەن بۆچوونی جیاجیای تێدا پەیدابوو، لەوانە: (کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان) (١٩٢٠)[١٧]، (کۆمەڵەی لاوانی کورد) (١٩٢١-١٩٢٣)، (کۆمەڵەی بەرگریی تورکمان)، (کۆمەڵەی کوردستان) (١٩٢٧)، (لقی کۆمەڵەی خۆیبوون) (١٩٢٧)[١٨]، (کۆمەڵەی پشتیوانی کوردان) (١٩٣٠)[١٩]، کە زادەی ئاراستەی سیاسیی هەمەجۆر بوون. هەر بۆیەش بێ سۆنگە نەبوو، کەرکوک ببووە مەڵبەندێك بۆ بە یەك گەیشتنی سێ چەشنە بانگەشە: (کوردی، تورکی، بەلشەفی)[٢٠]. ئەو ڕاستییەی، بۆ بەریتانییەکان ببووە جێی نیگەرانیو کەوتنەوەی تەنگو چەڵەمە لە ناوچەکەدا.

شەپۆلی ئەوبانگەشەو پڕوپاگەندەو جموجۆڵە سیاسییە لەلایەن بەریتانییەکانەوە ووردو بە شێنەیی مامەڵەی لەگەڵ کرا. ناوەڕاستی ساڵی (١٩٢٣)، (هێنری دۆبس) (*Sir Henry Dobbs*) کۆمیساری باڵای بەریتانی لە عێراق (١٩٢٣-١٩٢٩)، بۆ دڵنیابوون لە شکانەوەی ڕای خەڵك بە لای دەسەڵاتدا، سەردانی شاری کەرکوکی کردو ئامادەیی حکومەتو دەسەڵاتدارانی بەریتانی بۆ دابینکردنی مافە نەتەوەییو کەلتورییەکانی تورکمان جەخت کردەوە[٢١].

ئەو هەنگاوەو چەند هەنگاوێکی هاوشێوە، بوونە هۆی داکەوتنی پەرەسەندنی سیاسیی کاریگەر لە مێژووی ناوچەکە، کە بەشدارییکردنی بێ گرێو گۆڵی لیوای کەرکوك لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی دامەزراندنو[٢٢] یەکەم سەردانی (مەلیك فەیسەڵ) بۆ شاری کەرکوك، لە ڕۆژی (١٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٢٤)و[٢٣] سازدانی خۆپیشاندان بە مەبەستی پشتگیریکردن لە (حکومەتی عێراقی عەرەبی)، لە سەروەختی سەردانی لیژنەی کۆمەڵەی گەلان (شوباتی١٩٢٥)، بۆ بەلاداخستنی کێشەی ویلایەتی موسڵ[٢٤]، لەو پەرەسەندنە نوێیانە بوون، کە بوونە مایەی ئەوەی ئەم شارە بە دەوڵەتی تازەدروستبووی عێراقەوە بلکێندرێت. ئیتر لە دوای لکاندنی شاری کەرکوکو تەواوی ویلایەتی موسڵ بە دەوڵەتی تازە دروستبووی عێراقەوە جموجۆڵە سیاسییەکانی کەرکوك، بە ووردییش جموجۆڵی تورکمانەکان، کەوتە کزی[٢٥].

بەر لە کۆتاییەکانی ساڵانی ئینتیدابی بەریتانی، چەند مافێکی ڕۆشنبیریی سنووردار بەدیهات، وەك دەرچوواندنی ڕۆژنامەو[٢٦] بڵاوکردنەوەی کتێب بە زمانی خۆجێییو خوێندن بە زمانی تورکمانی بەپێی (قانوونی زمانە خۆجێییەکان) (قانون اللغات المحلية) لەنێو قەزای ناوەندیی کەرکوکدا. ئیدی لەم چوارچێوەیەدا، دەسەڵاتدارانی عێراق پاش ڕزگاربوونی عێراق لە ئینتیدابی بەریتانی مامەڵەیان لەگەڵ ئەم شارەدا کرد[٢٧].

سەروەربوونی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیی عێراق بەسەر شاری کەرکوکدا، بە شێوەیەکی توندوتۆڵتر، لە دوای بەدەستخستنی سەربەخۆیی عێراق لە (٣)ی تەشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٣٢)دا، پەیدابوو. وورده وورده ئەو چەند جیاووگە (الامتیازات) ڕۆشنبیریی و کلتوورییانەی کە شاری کەرکوك هەیبوو نەیانهێشت. بەڵکو سەرباری ئەوەش ئەو شارە بە زەقی کەوتە ژێر چنگی فەرمانبەرانی عەرەبی شارەکانی دیکە. فەرمانبەرانی خۆجێی لە پۆستە کارگێڕییە باڵاکانی شار دوورخرانەوە[٢٨]. سوپای عێراق کە دابەشکرایە سەر سێ فیرقە، شاری کەرکوك کرایە مەڵبەندی فیرقەی دووی ئەو سوپایە. فیرقەی دوو، کە ئەرکی پاراستنی سنوورەکانی باکووری عێراقو کۆمپانیای نەوتی عێراقی سنووردار بوو، تارماییەکی گەورەی بەسەر شارەکە دروستکردبوو[٢٩].

لە سەرنجدانێکی گشتییدا، ڕوون دەبێتەوە کە لە سییەکانی سەدەی ڕابردوو پەرەسەندنێکی سیاسیی کاریگەرو بەرچاوی ئەوتۆ لە بارودۆخی سیاسیی شاری کەرکوك نەهاتووەتە کایە، تەنها ئەوە نەبێت کە دەسەڵاتدارانی عێراقو ڕاوێژکارە ئینگلیزەکانیان ویستویانە باری سیاسی ئەم شارە سەقامگیرو دۆخە کلتورییە جیاوازەکەی لە ڕێگەی جۆراوجۆرەوە بە کلتووری عێراقەوە ببەسترێتەوەو ڕایەڵێکی پەیوەندی بەهێز لەنێوان ئەم شارە لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندی دروست بکەن، کە ئەو مەرامەشیان بە تێپەڕینی کات (١٩٢٥-١٩٤١) تا ڕادەیەك بۆ چووەسەر[٣٠].

پێویستە بوترێت، لە ئەنجامی جەنگی دووەمی جیهانییەوە (١٩٣٩-١٩٤٥) چالاکییە سیاسییەکانی دەستەی ڕووناکبیری کەرکوکی چووە قۆناغێکی نوێو کاریگەرەوە، چونکە جەنگەکە لەسەر بنەڕەتی ئایدیۆلۆژی یەکتربڕ سەری هەڵدا، لە لایەك نازییەتو فاشیەت بوونە جەمسەرێكو لە لایەکی دیکە وڵاتانی وەك (بەریتانیاو یەکێتیی سۆڤییەت) بوونە داکۆکیکار لە دیموکراتییەتو جەمسەرێکی سەرەکی دژ بە بیروباوەڕەکانی (ئەڵمانیای نازیو ئیتاڵیای فاشی)[٣١]. ئیدی هەموو ئەوانە ڕەنگدانەوەیان لەسەر چەشنی بیرکردنەوەو شێوەی تێکۆشانی فیکریو سیاسیی ڕووناکبیرە کەرکوکییەکان هەبوو. لەو بەرەنجامەدا ڕێکخستنی سیاسیی نهێنی لەنێو گەنجانی کەرکوکدا هاتە ئاراو کاریگەری بیروباوەڕە سیاسییەکانی ئەو ڕۆژگارەش شوێن پەنجەی گەورەیان لەسەر خەباتی ئەو ڕێکخستنە سیاسییانە نەخشاندووە. وەك: (کۆمەڵەی دارکەر) (١٩٣٧)و (حیزبی هیوا) (١٩٣٩)و ڕێکخستنەکانی (پارتی کۆمۆنیستی عێراق) لە ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانیدا[٣٢].

دیارترینو پڕکێشترین ڕووداوی سیاسیی ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی، سەبارەت بە شاری کەرکوك بریتییە لە بەشدارییکردنو پشتگیریکردنی سەرانی (ڕووداوەکانی

نیسان-مایسی ١٩٤١)ی عێراق[٣٣].

شاری کەرکوك، بەو پێیەی خاوەنی یەکێك لە دەوڵەمەندترین کێڵگە نەوتییەکانی عێراق‌و ناوچەکە بوو (باباگوڕگوڕ)، کە پێویستییەکی بایەخداری ئەو ڕۆژانەی بەردەوامبوونی کردە جەنگییەکانی وڵاتانی شەرکەر بوو، پێگەیەکی دیاری لە پلان‌و نەخشە سەربازییەکانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەبووە. کەرکوك دوای شاری بەسرە، بە دووەم پێگەی گرنگ‌و ستراتیژیی بەریتانیا لە عێراق دەژمێردرا. لەو ڕۆژگارە بووە مایەی نیگەرانی‌و دڵەراوکێیەکی زۆر بۆ بەریتانییەکان، کە لە دووتوێی بەڵگەنامەکانی ئەرشیڤی هێزی ئاسمانییان دەرکی پێ دەکرێت[٣٤].

لە لایەکی دیکەوە، بە پێی بەڵگەنامەیەکی ئەڵمانی، لە ڕۆژانی (ڕووداوەکانی نیسان- مایسی ١٩٤١)، ئەڵمانیای نازی‌و ئیتاڵیای فاشی پەیماننامەیەکی نهێنییان لەنێوان خۆیاندا مۆرکردووە، بە گوێرەی ئەو پەیماننامەیە لە ساتی سەرگرتنی ڕاپەڕینی عێراق، هەر لایەك سەدا پەنجای داهاتی نەوتی عێراق بۆ خۆی دەبات[٣٥]. بەڵام بەریتانیاییەکان هەر لە سەرەتاوە پلانی ووردیان بۆ لەباربردنی ئەو ئامانجەی وڵاتانی ئەڵمانیای نازی‌و ئیتاڵیای فاشی دانابوو، کە بریتیبوو لە تەقاندنەوەو وێرانکردنی بیرە نەوتەکانی کەرکوك‌و کۆگا نەوتییەکانی عێراق[٣٦].

شاری کەرکوك، لە پلانە بەرەنگارییەکانی (حکومة الدفاع الوطني)[٣٧] حکومەتی بەرگریی نیشتمانیشدا، پێگەی دیاری هەبوو. چونکە ڕابەرانی (بزووتنەوەی نیسان-مایسی ١٩٤١) پاش تێکچوونی باری سەربازییان‌و شکانەوەی تای تەرازووی هێز بەلای بەریتانییەکاندا، پلانی ئەوەیان هەبوو شاری کەرکوك بکەنە دوا سەنگەری ڕووبەڕووبوونەوە.

بە گوێرەی نووسینەکانی مێژوونووسی عێراقی (عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی)، کە خۆیشی یەکێك بووە لە بەشداربووەکانی ڕاپەڕینەکە، پاش تێکشکانی بەرەی پێشەوەی سوپای بەرەنگاریی عێراق لە (١٩)ی مایس، (حکومەتی بەرگریی نیشتمانی) بڕیاری گواستنەوەی مەڵبەندی حکومەتی لە بەغداوە بۆ کەرکوك خستووەتە بواری جێبەجێکردنەوە[٣٨]، بەو نیازەی کەرکوك، بکەنە دوا سەنگەری سەرەکی بۆ بەربەرەکانێی هەڵمەتەکانی هێزی بەریتانی[٣٩]. بەڵام دواتر لە (٢٩)ی مایس، لە ئەنجامی پێشهاتە نوێیەکانی کۆتای ڕۆژانی ڕاپەڕین، ئەو کارە بە ئەنجام نەگەیشت[٤٠].

جەماوەری کەرکوك بە شێوەیەکی گشتی، ڕاشکاوانە هەڵوێستی دوژمنکارانەی خۆیان، لە ڕۆژانی (ڕووداوەکانی نیسان- مایسی ١٩٤١)دا، بەرانبەر بە باڵا دەستی دەسەڵاتی بەریتانییەکان لە عێراق دەربڕی. هەر لە سەرەتای بەرپابوونی ڕاپەڕینەوە، دانیشتووانی کەرکوك کەوتنە پاڵپشتیکردنی ڕاپەڕینەکەو دەربڕینی خۆشحاڵیان بە گۆڕانکارییە سیاسییە نوێیەکانی بەغداد. هەر بۆ ئەو مەبەستە پێکهاتە جیاجیاکانی شاری کەرکوك، بە جیا و لە هەندێك هەلدا پێکەوە، پشتگیری خۆیان بۆ ڕابەرانی (ڕووداوەکانی نیسان- مایسی ١٩٤١) دووپات کردووەتەوەو شاندیان ڕەوانەی بەغداد کردووە[٤١].

هەروەها نوێنەرانی لیوای کەرکوکیش لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق هاوکات لەگەڵ پەرەسەندنەکانی بەغداد، کۆ دەنگ بوونە لەسەر لابردنی وەسیی تەخت (میر عەبدولئیلا) لە وەسایەت‌و دانانی (شەریف شەرەف) (١٨٨١-١٩٥٤) لە شوێنی ئەو لەو کۆبوونەوە هاوبەشەی ئەنجوومەنی نیشتمانی، کە لە (١٠ی نیسانی ١٩٤١)دا بەسترا[٤٢].

دانیشتووانی کەرکوك لە (٣)ی مایسی ساڵی (١٩٤١) دا خۆپیشاندان‌و ڕێپێوانی بەرفراوانیان ئەنجامدا[٤٣]، ڕۆژنامەکانی بەغداد ئەو خۆپیشاندان‌و ڕێپێوانەیان بە ناوی (خۆپیشاندانی نیشتمانیی گەورەی کەرکوك)ەوە نێوزەد کردو لەسەریان نووسی[٤٤]. هێزە سەربازییەکانی عێراقیش (فیرقەی دوو)، حەوتی مایس لە کەرکوك گەمارۆی کێڵگەکانی نەوت‌و وێستگەکانی دەرهێنانی نەوتیانداو دەستیان بەسەرداگرت[٤٥]. هەمان کات کەرکوك بووە شوێنی نیشتنەوەی فڕۆکەکانی ئەڵمانیای نازی‌و ئیتاڵیای فاشی. هێزی فڕۆکەوانی ئینگلیزەکان، بۆ چاوشکێنیی جەماوەری کەرکوك‌و پێکانی بەرژەوەندییەکانی هێزی ئاسمانیی ئەڵمانی‌و ئیتاڵی، لە (١٤)ی مایس، بە فڕۆکە جەنگییەکانیان کەوتنە بۆمبارانکردنی شاری کەرکوك[٤٦].

ڕووداوە سەربازییەکانی مایسی ساڵی (١٩٤١) مانگێکی نەخایاند، لە (٢)ی مایس دەستیپێکردو لە (٢٩)ی مایس کۆتایی پێهات. پاش کۆتایی هاتنی ڕاپەڕین دانیشتووانی شاری کەرکوك کەوتنە بەر هەڵمەتی ترس‌و تۆقاندن‌و خەڵکێکی زۆر خرانە زیندانەوە، بەو ئەندازەی لەم ڕووەوە دوای بەغداو هەولێر، شاری کەرکوك پلەی سێیەمی لەسەر ئاستی سەرجەم شارەکانی عێراق داگیرکردووە[٤٧].

وڵاتی عێراق لە دوای کپکردنەوەی (ڕووداوەکانی نیسان-مایسی ١٩٤١)، وەك پاشکۆیەکی ئابووری‌و سیاسیی دەوڵەتی زلهێزی بەریتانیای لێهات، ئابوورییەکەی بە هەمان شێوە بووە ئابووری جەنگ‌و جەنگیش درێژەی کێشا، لە ئەنجامی ئەوەشدا دەرهاویشتەیەکی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا، بە تایبەت لە بوارەکانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسی، لەو ئاکامەدا باری گوزەرانی دانیشتووانی قورسکردو مۆرکی ژیانیانی گۆڕی. ئەم ڕەوشە هەموو چین‌و توێژو گشت کونجێکی کۆمەڵگەی عێراقی گرتەوە.

ڕاستیی، ئەو بەشەی کۆمەڵگا، ئەوەی کە بە (ڕەنجدەر) ناوزەد دەکرێت‌و کرێکارانیش بەشێکی دیاری پێکدێنن، لە هەمووان پترتر کاریگەری ئەو بارودۆخەیان بەسەرەوە بوو. بۆیە ئەوان بەر لە هەر چین‌و توێژێکی دیکە بۆ بووژانەوەو خستنەوە سەر پێی باری ئابوورییان بە پەرۆش بوون. ئەم حاڵ‌و بارە، بە کۆتایی هاتنی جەنگیش گۆڕانێکی بنەڕەتی ئەوتۆی بە خۆوە نەدی[٤٨]. بۆیە لەو پێناوەداو بۆ دامەزراندنی سەندیکا کرێکارییەکان، کە دەستەبەری مافەکانی کرێکاران بکات‌و بەرپەرچی هەموو ڕەنگێکی چەوسانەوە بدات، کرێکارانی عێراق بە دەستپێکردنی مانگرتن‌و خۆپیشاندان لە شارە گەورەکاندا، کەوتنە هەوڵی دامەزراندنی سەندیکا کرێکارییەکان. بەڵام گرنگترین‌و کاریگەرترینیان لە ژیانی سیاسیی عێراق بریتییە لە ڕووداوەکانی (گاوڕباغی)

(١٩٤٦)، کە لەلایەن کرێکارانی (کۆمپانیای نەوتی عێراق)ەوە (IPC) لە شاری کەرکوك ئەنجامدرا[49].

سەرەتای دەستپێکردنی ئەو ڕووداوانە، بەرزکردنەوەی یادداشتێك بوو لە سەرەتای مانگی حوزەیراندا، کە چەند کرێکارێك لەپێناوی چاککردنی باری گوزەرانیان تیایدا چەند داواکارییەکیان پێشکەش بە بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیاکەیان کردبوو[٥٠]. بەڵام بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیا وەڵامی ئەو داواکارییانەی نەدایەوە. بۆیە ئەو هەڵوێستە کرێکارەکانی سوورتر کردو لە ڕۆژی (٨)ی حوزەیراندا، چەند یادداشتێکی هەڕەشە ئامێزیان ئاراستەی بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیا کرد. کۆمپانیا لەو ڕۆژە بەدواوە کارەکەی بەهەند وەرگرت و سەرەتاش کەوتە هەمەهانگی و پلان دارشتن لەگەڵ (عەبدولرەزاق فەتاح) بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرکوك بە مەبەستی ئامادەباشی بۆ هەر ڕووداوێکی لەناکاو. لە ئاکامی درێژەکێشانی کێشەکە، کرێکاران لە (٣)ی تەمووز مانگرتنی گشتییان لە (گاورباغی) ڕاگەیاند[٥١]. هەر لە یەکەم ڕۆژی دەستپێکردنی مانگرتنی گشتییەوە، ڕێکخستنەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراقی لە کەرکوك، کەوتنە پشتگیریکردنی داواکارییەکانی کرێکاران و هاندان و ئاراستەکردنیان[٥٢].

هەرچەندە (ڕووداوەکانی گاورباغی) لە سەرەتادا بە پاڵنەری ئابووری سەریان هەڵدا، بەڵام لە ئاکامی ئەو پەرەسەندنانەی بە خۆوەی گرتن ڕێرەوی ڕووداوەکانی بە ئاقارێکی سیاسییانەی ڕووتدا ڕۆشتن. کرێکارە مانگرتووەکان ئێوارەی هەموو ڕۆژێك، وەك پیشە، لە گاورباغی کۆدەبوونەوەو وتاریان بۆ دەخوێندرایەوە. ڕێپێوان و وتار خوێندنەوە لەلایەن لێژنەی باڵای مانگرتنی کرێکاران لە گاورباغی بە مەبەستی هۆشیارکردنەوەی کرێکارە مانگرتووەکان، لە سیما سەرەکییەکانی ئەو قەڵەمبازە مێژووییەی خەباتی چینی کرێکاری حسێب دەکرێت[٥٣].

پێداگرتنی کرێکارە مانگرتووەکان، حکومەتی ناچار کرد بە هەڵوێستی خۆیدا بچێتەوە. یەکەم هەنگاوی حکومەت لە ڕۆژی (٨)ی تەمووزدا گۆڕینی موتەسەڕیف (ئەمین خالس) بوو بە (حەسەن فەهمی). موتەسەڕیفی نوێ هەر زوو کەوتەخۆ بۆ بەلاداخستنی ئەو بارودۆخە نائاسایی و شڵەژاوەی شاری کەرکوك. بۆیە پەیوەندی بە کرێکارە مانگرتووەکانەوە کردو بەڵێنی جێبەجێکردنی هەموو ئەو داواکارییانەی پێدان کە لە توانایدا هەیە جێبەجێی بکات. لە (١٠)ی تەمووز بەیاننامەیەکی بۆ کرێکارە مانگرتووەکان دەرکرد، کە تیایدا هاتبوو کۆمپانیا ئامادەی تێدایە بۆ جێبەجێکردنی داخوازییەکانیان تەنها بەو مەرجەی بگەڕێنەوە سەر کار. بەڵام مانگرتنەکە بە بەڵێنەکانی موتەسەڕیف بڵاوەی پێنەکرا، کرێکاران سووربوون لەسەر درێژەدان بە مانگرتن[٥٤].

موتەسەڕیف چەند جارێکی دیکە لە ڕۆژانی (١١)و (١٢)ی تەمووز لەگەڵ نوێنەرانی کرێکاران کەوتە وتووێژەوە، کرێکاران هەر پێداگیربوون لەسەر مانگرتن[٥٥]، بۆیە موتەسەڕیف بە بیانووی ئەوەی ئەو مانگرتن و کۆبوونەوانە کار دەکەنە سەر باری ئاسایشی گشتیی شار، بەپێی قانوونی گردبوونەوەکانی عوسمانی (قانون التجمعات العثمانية) ژمارە (١٣١)ی ساڵی (١٩١٠)، بڕیاریدا هێز بۆ کۆتایی پێهێنانی ئەو مانگرتنە بخاتە کار[٥٦]. ئیدی لەو ئەنجامەدا ئێوارەی ڕۆژی (١٢)ی تەموون)، هێزی پۆلیس لە سێ لاوە دەوری کرێکارە مانگرتووەکانی گاورباغی دا، چەند جارێك فەرمانی بڵاوە پێکردنیان پێدان، بەڵام بە گوێیان نەکردن. بە پێی ئەو لێکۆڵینەوانەی دواتر لەلایەن حکومەتەوە ئەنجامدرا، یاریدەدەری بەڕێوەبەری پۆلیس (سەعید عەبدولغەنی) چەند جارێك فەرمانی بە مانگرتووان داوە بڵاوەی لێ بکەن، بەڵام بە گوێیان نەکردووە، بەڵکو کەوتوونەتە بەرد تێگرتنیشی، بۆیە ئەوانیش دەست دەکەن بە تەقە[٥٧]، لە ئاکامدا ژمارەیەك کرێکاری مانگرتوو دەکوژرێن و زۆری دیکەش زامدار دەبن[٥٨].

لە ئەنجامی ڕووداوەکانی گاورباغییەوە، دەنگی نارەزایی لە زۆر لاوە دژ بە ڕەفتارەکانی حکومەت و کۆمپانیای نەوتی عێراقی سنووردار بەرزبۆوە. حکومەت هەوڵی ئەوەیدا تۆمەتی کوشتارەکە بخاتە ئەستۆی کرێکارە مانگرتووەکان، بەڵام دواتر لەلایەن ڕاپۆرتی ئەو لێژنە فەرمیانەی کە بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوەی ڕووداوەکان پێکهێنران، ڕوونکرایەوە کە کەمتەرخەمی دەسەڵاتدارانی کەرکوك بووەتە هۆی ڕوودانی ئەو کوشتارە[٥٩].

هەرچەندە لە دەقی ڕاپۆرتێکدا هاتبوو کە پێویستە بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس و جێگیرەکانی دەست لەکار بکێشنەوە، بەڵام لە ئەنجامی دەستێوەردانی باڵیۆزخانەی بەریتانی، هەڵوێست لە بەرانبەر ئەو بەرپرسانە وەرنەگیرا، بۆیەش وەزیری ناوخۆ (عەبدوڵڵا قەساب) دەستی لەکار کێشایەوە[٦٠].

ڕووداوەکانی گاورباغی هەست و سۆزی جەماوەری کەرکوکی وروورژاندو ڕۆژی (١٣)ی تەمووز بە ژن و پیرو جەوانیانەوە خۆپیشاندانێکی گەورەیان ڕێکخست و دروشمی بڕوخێ حکومەتی (ئەرشەد ئەلعومەری)یان بەرز کردەوەو نارەزاییان دژی ئینگلیزەکان و نۆکەرانیان دەربڕی و داوای دەستبەجێ بەردانی گیراوەکانیان کرد[٦١].

لە لایەکی دیکە، سەندیکا کرێکارییەکان و پارتە سیاسییەکانی سەر گۆڕەپانی ئەو ڕۆژگارەی عێراق، بە توندی کوشتارەکەیان مەحکووم کردو یەك بە دوای یەك یادداشت و نارەزایی خۆیان ئاراستەی حکومەت کرد[٦٢].

ڕۆژنامە خاوەن هەڵوێستە نیشتمانییەکانی عێراقیش، لە ئەنجامی ڕووداوەکانی گاورباغیدا، بە دەنگ هاتن و ئیدانەی کوشتارەکەیان کردو پەردەیان لەسەر ڕووداوە خوێناوییەکەی گاورباغی هەڵماڵی[٦٣].

دەرئەنجامی گرنگ و دیاری (ڕووداوەکانی گاورباغی)، جێبەجێکردنی داواکارییەکانی کرێکاران لەلایەن کۆمپانیای نەوتی عێراق لە (١٦)ی تەمووزی ساڵی (١٩٤٦) داو گەڕانەوەی کرێکاران بۆ سەر کارەکانیان و دواتریش ڕووخانی حکومەتی (ئەرشەد ئەلعومەری) بوو لە (١٤)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٤٦)دا[٦٤].

پەرەسەندنە سیاسییەکانی دواتری شاری کەرکوك،

راشکاوانە ناحەزایەتی و رق و قینەی دانیشتووانی ئەم شارە بەرانبەر بە دەسەڵاتی ئینگلیزو دەست و پێوەندەکانیان دووپات دەکاتەوەو ئەوەش دەداتە دەست، کە هەر کاتێك ماوەو بیانوو هاتبێتە ئاراوە، کەرکوکییەکان دژایەتی بێ سێ و دووی خۆیان بۆ نەمانی دەسەڵاتی ئینگلیزو نۆکەرانیان نیشانداوە. بێ هۆ نەبوو شاری کەرکوك لەسەر وەختی خۆپیشاندان و رووداوەکانی کانونی دووەمی ساڵی (١٩٤٨) (الوثبة)، کارایانە بەشداری لە خۆپیشاندانەکاندا کرد. راپەرین و خۆپیشاندانەکانی کانونی دووەمی ساڵی (١٩٤٨)، "لە ئاکامی ئەو زنجیرە هەنگاوە چەوتانەی حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی رۆژگاری پاشایی بوو، کە بە ئاراستەی پێکەوەلکانی وڵاتی عێراق بە رەوڕەوەی بەرژەوەندییە ئابووری و سیاسی و سەربازییەکانی بەریتانیا تەکانی دەدا"[٦٥]. ئەوەش بووە مایەی بەرزبوونەوەی ئاستی نارەزایی لەلایەن تەواوی چینەکانی کۆمەڵ و پارتە سیاسییەکانی ئەو رۆژگارەی عێراق.

پەیماننامەی (پۆرت سمۆس) لە (١٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٤٨) بە مەبەستی رێکخستنی پەیوەندییەکانی عێراق و بەریتانیا لەنێوان (ساڵح جەبر) (١٩٠٢-١٩٥٧) سەرۆك وەزیران بە نوێنەرایەتی دەوڵەتی عێراق و (ئەرنەست بێڤن) سکرتێری دەوڵەتی بەریتانی بۆ کاروباری دەرەوە مۆرکرا، تاوەکو شوێنی پەیماننامەی ساڵی (١٩٣٠) بگرێتەوە. ئەوەش بووە مایەی کەوتنەوەی نارەزاییەکی توند لە عێراقدا. چونکە رەتکردنەوەی پەیماننامەی (ئەنگلۆ عێراقی ساڵی ١٩٣٠)، یەکێك لەو داواکارییانە بوو کە میللەت و وڵاتپەروەرانی عێراق خوازیاری نەمانی بوون. بۆیەش لە ئاکامی مۆرکردنی ئەو پەیماننامەیەوە، وەك نیشاندانی نارەزایی، پەرچەکرداری بەرفراوان لە شارو ناوچەکانی عێراق، بە تایبەت لە بەغدادی پایتەخت ئەنجامدران[٦٦].

شاری کەرکوك بۆ پشتگیری لە خۆپیشاندان و رێپێوانەکانی بەغداد، رێپێوانێکی جەماوەریان سازکرد کە زیاتر بە سەرپەرشتی کوردە کۆمۆنیستەکانی شار بوو. هەروەها لە کۆتاییەکانی مانگی کانوونی دووەمدا هێرشیان کردە سەر کۆنسوڵخانەی بەریتانی لە نێو شارەکەو دەزگاکانی کۆمپانیای نەوت بە ترس و ئاگاییەکی زۆرەوە چاودێری خۆپیشاندانەکانیان کردووە. بەڵام توندوتیژترین پەرچەکرداری خۆپێشاندەرانی کەرکوك، لە رۆژی (٢٧)ی کانونی دووەم ئەنجامدرا، ئەویش هەڵمەتبردنە سەر نووسینگەی ئیرشادی بەریتانی و سووتاندنی بوو، وەك تۆڵەسەندنەوەیەك بۆ گیانی قوربانییانی شاری بەغدا[٦٧].

پارتی کۆمۆنیستی عێراق، کە لەو راپەرینەی عێراقدا شوێن پەنجەی دیاری هەبوو، لەنێو شاری کەرکوکیشدا رۆڵی هەبووەو توانیویەتی بە رێکخستنی جەماوەری خۆپیشاندەرو هاندان و ئاراستەکردنیان چالاکی بنوێنێت. سەرباری ئەوانەش لە شاری کەرکوکدا (لیژنەی ناوخۆیی)ی کەرکوکی پارتی کۆمۆنیستی عێراقی، لە ژێر پەردەو بە نێوی (میهرەجانی شیعر) لە سینەمای عەلەمێنی کەرکوك و بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆری نووسەرو رۆشنبیری کوردو عەرەب و تورکمان، کە ماوەی سێ رۆژ بەردەوامبوو، لە (٥)ی مارتی ساڵی (١٩٤٨) یادی چلەی ماتەمینی شەهیدانی بەغدایان کردەوە[٦٨]. ئەو چلەیە، بەرزڕاگرتنێکی گەورە بوو بۆ خەبات و تێکۆشانی شەهیدەکان.

لە ئەنجامی بەردەوامبوونی نارەزاییەکان و تێکچوونی بارودۆخی عێراق، حکومەتەکەی (ساڵح جەبر) لە (٢٧)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٤٨) ناچاربوو دەست لەکار بکێشێتەوەو پەیماننامەی (پۆرت سمۆس)یش هەڵوەشێندرایەوەو کاری پێنەکرا[٦٩].

شاری کەرکوك لە پەرەسەندنە سیاسی و رووداوە نیشتمانییەکانی دیکەی عێراقدا دوورەپەرێز نەبوو، وەك: (راپەرینی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٥٢)، هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ساڵی (١٩٥٤)، پەیمانی بەغدای ساڵی (١٩٥٥)، رێپێوان و خۆپیشاندانەکانی ساڵی (١٩٥٦)، شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژی ساڵی (١٩٥٨))[٧٠]، بەڵکو بۆ دژایەتیکردنی دەسەڵاتی بێگانە (ئینگلیز) و دەست و پێوەندەکانیان هەردەم ئامادە بووەو پێگەی دیاری هەبووە، بە تایبەت هەڵوێستی لە هێرشی سێ قۆڵی بۆ سەر میسر ساڵی (١٩٥٦).

کەرکوکییەکان بۆ پشتگیریکردنی گەلی میسری بە سەرکردایەتی (جەمال عەبدولناسر) دژی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیسرائیل، خۆپێشاندانێکی جەماوەری بەرچاویان ئەنجام دا. رۆشنبیران و نووسەرانیش لەو پێناوەدا کەوتونەتە پشتگیریکردنی گەلی میسری[٧١].

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

(١) بە درێژایی مێژوو ئەم شارە ناوی جۆربەجۆری بەخۆوە دیوە. بەلام کۆنترین ناوبردنی بەم شێوەیەی ئەمڕۆی (کەرکوك) دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پانزەهەمی زایینیو لەلایەن (شرف الدین علی یزدی) لە پەرتووکی (ظفرنامە)دا بەکار براوە. بڕوانە:

– (الیزدی، ظفرنامه، جلد یکم، (بتصحیح و اهتمام: محمد عباسی)، تهران، ١٣٣٦هـ.ش، الصفحة ٤٩٦).

دەربارەی ناوەکانی ئەم شارەو بنەچەی ناوی (کەرکوك)، بڕوانە:

– جمال بابان، (اصول اسماء المدن والمواقع العراقية)، الجزء الأول، الطبعة الثانية، ١٩٨٦، الصفحات ٢٤٨–٢٥٠.

– توفيق وهبي بك، (الآثار الكاملة)، الجزء الاول، إعداد: رفيق صالح، السليمانية، ٢٠٠٦، الصفحات ٢٤٧–٢٥٧.

(٢) بڕوانە:

– المس بيل، (فصول من تأريخ العراق القريب ١٩١٤–١٩٢٠)، ترجمة: جعفر الخياط، الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٧١، الصفحة ١٥٣.

– شكري محمود نديم، (حرب العراق ١٩١٤–١٩١٨)، الطبعة الثامنة، بغداد، ١٩٧٤، الصفحة ٢٠١.

(3) A.T. Wilson. Mesopotamia (1917-1920): A Clash of loyalties. Oxford University Press. London. 1931. P.86.

(٤) کۆنگرەی قاهیرە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی بەریتانیای گەورە بە ناوچەکانی مانداتەوە (عێراق، ڕۆژهەلاتی ئوردن، فەلەستین) ساز کرا. بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە:

– ياسين طه ظاهر العسكري، (مؤتمر القاهرة والمسألة الكردية في العراق)، في: (المفصل في تاريخ العراق المعاصر)، بيت الحكمة، بغداد، ٢٠٠٢، الصفحات ٨١١–٨٣٦.

(5) P.R.O. Report on Middle East. Appendix (10). Kurdistan. Fourth meeting of the political committee. March 15. 1921. Ps.59-60.

(6) P.R.O. Report on Middle East. Fourth meeting of the combined political and military committees. March 16. 1921. Ps.55-56.

(7) D. Kinnane. the Kurds and Kurdistan. Oxford University Press. London. 1957. P.37. (لە وەرگێڕانە کوردییەکە، لاپەڕە ٢٨)

(8) S.H. Longrigg. Iraq: 1900 To 1950 (A Political. Social And Economic History). Oxford University Press. Great Britain. 1953. P.130. (في نسختهالمترجمة الى العربية: الجزء الاول، ص١٥٧)

(9) S. R. Sonyel. Turkish Diplomacy (1918-1923). Mustafa Kemal and the Turkish National Movement. Sage Publications Ltd.. London. 1975. P.150.

(10) D. Mcdowall. A Modern History of the Kurds. I.B. Tauris & Co Ltd.. London. 1996. P.167.(لە وەرگێڕانە کوردییەکە، لاپەڕە ٢٨١)

(١١) فؤاد حمه خورشيد، (كركوك قلب كردستان)، من مطبوعات المديرية العامة للطباعة والنشر في وزارة الثقافة، السليمانية، ٢٠٠٥، الصفحات ٦٢–٨٤.

(12) P.R.O. Report on Middle East. Fourth meeting of the combined political and military committees. March 16. 1921. Ps.55-56.

(13) A.T. Wilson. Op.Cit. P.137.

(١٤) دەربارەی بڕوانە: پشکۆ حەمەتاهیر ئاغجەلەری، (شاری کەرکوك لەنێوان سالانی ١٩١٧–١٩٢٦)، توێژینەوەیەکی مێژوویی–سیاسییە، سلێمانی، ٢٠٠٧، لاپەڕە ١٨٧–٢١٧.

(١٥) ناوەڕاستی مانگی نیسانی سالی (١٩٣٦)، دەسەلاتدارانی عێراق ئەو شارەیان کردە مەلبەندی فیرقەی دووەمی سوپای عێراق. بڕوانە:

– شكري محمود نديم، (التشكيلات العسكرية في الموصل)، في: (موسوعة الموصل الحضارية)، المجلد الرابع، الموصل، ١٩٩٢، الصفحة ٢٢٨.

(١٦) قاسم خلف عاصي الجميلي، (العراق والحركة الكمالية ١٩١٩–١٩٢٣)، اطروحة دكتوراه، مقدمة الى مجلس كلية الآداب بجامعة بغداد، ١٩٩٠، الصفحة ١٤٢.

(١٧) بڕوانە:

– ڕەفیق حیلمی، (یادداشت)، سێیەمین چاپ، سلێمانی، ٢٠٠٣، لاپەڕە ١٩٨–بەدواوە.

– کەمال ڕەئوف محەممەد، (مستەفا ساییب ئەستێرە گەشەی کورد)، سلێمانی، ١٩٩٩، لاپەڕە ١٣–١٤.

– عثمان علي، (دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة ١٨٣٣–١٩٤٦) دراسة تأريخية وثائقية، اربيل، ٢٠٠٣، الصفحات ٤١٠، ٤٣٠.

– وليد حمدي، (الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية، دراسة تاريخية وثائقية)، لندن، ١٩٩١، الصفحات ٢٠٦–٢٠٧.

– گۆڤاری (هیوا)، پاریس، ژمارە (٧)، پاییزی ١٩٩٠، لاپەڕە ٣٦–٣٧، لێکۆلینەوەیەکە بە ناونیشانی: (بزووتنەوەی کورد)، نووسینی: نەزەند بەگی خان.

(18) Abbas Vali (ed). Essays on the Origins of Kurdish Nationalism. Mazda Publishers. California. 2003. P.197.

(19) S.S.O. Mosul. Very secret. Kurdish Nationalism. (6th February. 1930); S.S.O. Mosul. Secret. Kurdish Nationalism and the Komeli Pishtewani Kurdan. (18th February. 1930)

(20) S.H. Longrigg. Iraq (1900-1950). P.145.
(في نسخته المترجمة الى العربية، الجزء الاول: الصفحة ١٩٠)
(21) Iraq Administration Reports (1914-1932). Vol: (7). 1920-1924. Report by: His Britannic Majesty's Government on the Administration of Iraq for the Period (April. 1923- December 1924). P.522.

(٢٢) محمد مظفر الأدهمي، (المجلس التأسيسي العراقي)، الجزء الثاني، الطبعة الثانية، بغداد، ١٩٨٩، الصفحة ٩٨.

(٢٣) بۆ یەكەمجار لەو مێژووەدا ئاڵای عێراق لەسەر دامودەزگاكانی كەركوك بەرز كرایەوە. بڕوانە:
- عبدالرزاق الحسني، (تأريخ الوزارات العراقية)، الجزء الأول، الطبعة السابعة، بغداد، ١٩٨٨، الصفحة ٢٠٥.

(٢٤) جريدة (الأستقلال)، (١٧) شباط ١٩٢٥، النجف الاشرف، ١٩٧٥، الصفحة ١٩٧، مقتبس من: (الحركة الوطنية في العراق ١٩٢١-١٩٣٣)، عبدالأمير هادي العكام.

(٢٥) دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان، (كەركوك لێكۆڵینەوەیەكی مێژوویی دەربارەی ڕۆڵی ڕۆشنبیریو سیاسی ١٩٣٢-١٩٥٨)، نامەی ماستەر، پێشكەشی ئەنجوومەنی كۆلێژی ئەدەبیات لە زانكۆی سەلاحەددین- هەولێر كراوە، ٢٠٠٦، لاپەڕە ٣٧.

(٢٦) وەكو ڕۆژنامەی (كەركوك)، كە ساڵی (١٩٢٦) بە زمانی توركمانی دەردەچوو، دواتر لە ساڵی (١٩٣٠) لە چەند ژمارەیەكدا بە زمانی كوردیش بڵاودەكرایەوە.
- مجلة (گولان العربي)، العدد (٤٣)، اربيل، كانون الأول ١٩٩٩، الصفحات ٥٥-٥٩، موضوع بعنوان: (جريدة كركوك الكوردية عام ١٩٣٠)، احمد تاقانه.

(٢٧) عبد اللطيف بندر اوغلو، (التركمان في عراق الثورة، تاريخهم، لغتهم، آدابهم، تراثهم)، بغداد، ١٩٧٣، الصفحة ١٩.

(٢٨) بۆ نموونە دەگمەن هەڵكەوتووە كوردێك یا توركمانێكی شار بۆ پۆستی موتەسەریفییەتی لیوای كەركوك ڕاسپێردرا بێت. لەم بارەوە، بڕوانە:
- دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان، سەرچاوەی پێشوو، پاشكۆی ژمارە (٢).

(٢٩) محەمەد عەبدوڵڵا كاكەسوور، (ڕۆڵی سیاسیو كەلتوریی ئەفسەرانی كورد لە بزاڤی كوردایەتیی كوردستانی باشووردا ١٩٢١-١٩٤٥)، هەولێر، ٢٠٠٠، لاپەڕە ٩٨.

(٣٠) بۆ گەواهی دروستی ئەم بۆچوونە دەكرێ سەرنج بدرێتە بەشدارییەكانی شاری كەركوك لە خۆپیشاندانو ڕەوتو بزاڤە نیشتمانییەكانی دواتری عێراق، وەك: پشتگیریكردنی شاری كەركوك بۆ: ڕاپەڕینی نیسان - مایسی ساڵی (١٩٤١)و وەسبەی (وثبة) كانونی ساڵی (١٩٤٨)و خۆپیشاندانەكانی ساڵانی (١٩٥٢)و (١٩٥٦)و شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژی ساڵی (١٩٥٨).

(٣١) بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە: دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٠٧.

(٣٢) هەمان سەرچاوە، بەشەكانی سێیەمو چوارەم.

(٣٣) دەربارەی (ڕووداوەكانی نیسان- مایسی ١٩٤١)، بڕوانە:
- عبدالرزاق الحسني، (الاسرار الخفية في حركة السنة ١٩٤١ التحررية)، الطبعة الثالثة، لبنان، ١٩٧١.

(٣٤) وليد محمد سعيد الاعظمي، (انتفاضة رشيد عالي الكيلاني والحرب العراقية - البريطانية ١٩٤١)، دراسة موثقة في المضامين السياسية و القومية و الاستراتيجية لثورة مايس ١٩٤١، بغداد، ١٩٨٧، الصفحات ٥٢-٥٤.

(٣٥) المصدر نفسه، الصفحة ٥١.

(٣٦) د. ك. و. ع، الوحدة الوثائقية، وزارة الحرب، رقم الوثيقة (١٤٢٧/٢٠١، اكس ان ٢٢٠٥)، سري للغاية، الموضوع: الخطة العامة (تخريب مخازن الوقود في العراق)، (حوادث مايس ١٩٤١).(نسخة مترجمة ومصورة عن الارشيف البريطاني).

(٣٧) ئەم حكومەتە لە كاتی (ڕووداوەكانی نیسان- مایسی ١٩٤١)دا لەلایەن ڕابەرانی بزووتنەوەی مایسەوە هێنرابووە ئارا، بە نەمانی (ڕووداوەكانی نیسان- مایسی ١٩٤١) ئەمیش بوونی نەما.

(٣٨) دەربارەی هۆیەكانی هەڵبژاردنی كەركوك، بڕوانە: نجم الدين السهروردي، (التأريخ لم يبدأ غداً، حقائق وأسرار عن ثورتي رشيد عالي الكيلاني ٤١ و٥٨ في العراق)، قطر، ١٩٨٨، الصفحة ١٢٥.

(٣٩) عبدالرزاق الحسني، (الاسرار الخفية)، الصفحات ٢٣٩-٢٤٤.

(٤٠) عبدالرزاق الحسني، (تأريخ الوزارات العراقية)، الجزء الخامس، الصفحة ٢٨٤.

(٤١) دەربارەی هەڵوێستی كەركوكو كەركوكییەكان لە (ڕاپەڕینی نیسان- مایسی ١٩٤١)دا، بڕوانە: كەمال مەزهەر، (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی كورد)، بەرگی دووەم، ئامادەكردنی: عەبدوڵڵا زەنگەنە، دەزگای چاپو بڵاوكردنەوەی موكریانی، هەولێر، ٢٠٠١، لاپەڕە ١٣٠-١٤٨.

(٤٢) م. م. ن، الدورة الانتخابية التاسعة، الاجتماع الاعتيادي لسنة ١٩٤١، الجلسة المشتركة في (١٠ نيسان ١٩٤١)، الصفحة ٤٥.

(٤٣) مستەفا نەریمان، (بیرەوەرییەكانی ژیانم)، خانەی (الحرية) بۆ چاپ، بەغدا، ١٩٩٤، لاپەڕە ٥٦.

(٤٤) بڕوانە:
- جريدة (الزمان)، بغداد، ٧ آيار ١٩٤١.
- جريدة (العالم العربي)، بغداد، ١٠ آيار ١٩٤١.

(٤٥) وليد محمد سعيد الاعظمي، المصدر السابق، الصفحة ٥٤.

(٤٦) عبدالرزاق الحسني، (تأريخ الوزارات العراقية)، المصدر السابق، الجزء الخامس، الصفحات ٢٦٦، ٢٨٤.

(٤٧) گیراوەكانی كەركوك (٣٧) كەس بوون، بڕوانە:
- كەمال مەزهەر، (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی كورد)، بەرگی دووەم، لاپەڕە ١٤٨.

(٤٨) دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٣٠.

(٤٩) جعفر عباس حميدي، (التطورات السياسية في العراق

١٩٤١-١٩٥٣)، مطبعة النعمان، النجف، ١٩٧٥، الصفحة ٤٢٨.

(٥٠) دەربارەی داواکارییەکان، بڕوانە:
- عبدالرزاق الحسني، (تأريخ الوزارات العراقية)، الجزء السابع، الصفحة ١١٢.

(٥١) بڕوانە:
- عبدالرزاق الحسني، (تأريخ الوزارات العراقية)، الجزء السابع، الصفحات ١١٥-١١٨.
- محمد مهدي كبة، (مذكراتي في صميم الاحداث ١٩١٨-١٩٥٨)، منشورات دار الطليعة، بيروت، تشرين الثاني ١٩٦٥، الصفحات ٢٠٨-٢١٠.

(٥٢) يوسف حنا يوسف، (مذكرات يوسف حنا يوسف - ابو حكمت)، مطبعة التعليم العالي، اربيل، دون سنة الطبع، الصفحة ٣٨.

(٥٣) رزاق ابراهيم حسن، (تأريخ الطبقة العاملة في العراق بين الاضرابات و بناء التنظيم النقابي ١٩١٨-١٩٦٨)، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت، ١٩٧٦، الصفحة ٧٨.

(٥٤) جعفر عباس حميدي، (السياسية في العراق ١٩٤١-١٩٥٣)، مطبعة النعمان، النجف، ١٩٧٥. الصفحات ٤٣٦-٤٣٧.

(٥٥) پێدانی بەڵێنی ناڕاستو دەستی دەستی پێکردنی کرێکاران لەلایەن کۆمپانیاوە وایکردبوو کرێکارەکان سەرسەخت بن لە نواندنی هەڵوێستیان.

(٥٦) عبدالرزاق الحسني، (تأريخ الوزارات العراقية)، الجزء السابع، الصفحات ١١٤.

(٥٧) بڕوانە:
- عبدالرزاق الحسني، المصدر نفسه، الجزء السابع، الصفحة ١١٦.
- عبدالرحمن البياتي، (سعيد قزاز ودوره في سياسة العراق حتى عام ١٩٥٩)، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، ٢٠٠١، الصفحة ٦٣.

(٥٨) سەبارەت بەو ئاکامە، جیاوازییەکی بەرچاو لەنێو سەرچاوەکاندا هەیە، بەپێی سەرچاوە فەرمییەکان بێ، پێنج کەس کوژراوەو چواردەش بریندار بووە، بڕوانە:
- عبدالرزاق الحسني، (تأريخ الوزارات العراقية)، الجزء السابع، الصفحة ١١٦.

بەڵام هەندێك سەرچاوە پێیان وایە ژمارەکە لەوە زیاترەو حکومەت بۆ کەمکردنەوەی قەبارەی تاوانەکەی ئەو زانیارییەی تێ بزرکردووە. (مەجید خەدوری) دەڵێت: هەشت کوژراو ژمارەیەك بریندار، توێژەرێکیش دەڵێ شەش کوژراو چواردە بریندار، هەشە زۆر لەوە زیاتر هەڵدەکشێ و دەیگەنێتە شانزە کوژراو دەیان بریندار. بڕوانە:
- خالد محسن محمود الراوي، (تأريخ الحركة العمالية في القطر العراقي ١٩٦٨-١٩٧٥)، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية الاداب بجامعة بغداد، ١٩٨٠، الصفحة ٥٤.
- رزاق ابراهيم حسن، المصدر السابق، الصفحة ٧٤.
- Majid Khadduri. Independent Iraq (1932-1958) a study in Iraqi politics. second Edition. Oxford University press. London. 1960. p.257.

(٥٩) عبدالرحمن البياتي، المصدر السابق، الصفحات ٦٣-٦٤.

(٦٠) عبدالرزاق الحسني، (تأريخ الوزارات العراقية)، الجزء السابع، الصفحة ١١٧.

(٦١) بڕوانە:
- جعفر عباس حميدي، المصدر السابق، الصفحة ٤٣٩.
- نصير سعيد الكاظمي، المصدر السابق، الصفحة ٢١٠.

(٦٢) بڕوانە:
- عبد الجبار عبد مصطفى، (تجربة العمل الجبهوي في العراق ١٩٢١-١٩٥٨)، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٧، الصفحة ٢١٩.
- اسماعيل احمد ياغي، (تطور الحركة الوطنية العراقية ١٩٤١-١٩٥٢)، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٩٧٩، الصفحات ١٤٠-١٤١.

(٦٣) قيس عبدالحسين الياسري، (الصحافة العراقية والحركة الوطنية من نهاية الحرب العالمية الثانية حتى ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨)، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٨، الصفحة ١٧٧.

(٦٤) عبدالرزاق الحسني، (تأريخ الوزارت العراقية)، الجزء السابع، الصفحات ١٢٥-١٢٦.

(٦٥) دەربارەی ڕاپەڕینی کانوونی دووەم، بڕوانە:
- كمال مظهر أحمد، (صفحات من تأريخ العراق المعاصر، دراسات تحليلة)، منشورات مكتبة البدليسي، بغداد، ١٩٨٧، الصفحات ١٣١-١٤٣.

(٦٦) خميس حزام والي، (وثبة كانون الوطنية في العراق ١٩٤٨)، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية القانون والسياسة بجامعة بغداد، ١٩٧٩، صفحات متعددة.

(٦٧) عبدالرزاق الحسني، (تأريخ الوزارات العراقية)، الجزء السابع، الصفحة ٢٧٤.

(٦٨) الحكومة العراقية، الشرطة العامة، شعبة التحقيقات الجنائية ببغداد، موسوعة سرية خاصة بالحزب الشيوعي العراقي السري، الجزء الأول، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٤٩، الصفحة ٨٤.

(٦٩) عبدالرزاق الحسني، (تأريخ الوزارات العراقية)، الجزء السابع، الصفحة ٢٨٢.

(٧٠) غانم محمد الحفو و عبدالفتاح علي البوتاني، (الكورد والأحداث الوطنية في العراق خلال العهد الملكي ١٩٢١-١٩٥٨)، دار سبيريز للطباعة والنشر، دهوك، ٢٠٠٥، الصفحة ٩٢ و ٩٥-١٠٢.

(٧١) عبدالستار طاهر شريف، (الأخوة العربية الكردية وإنعكاسها في الأدب الكردي)، بغداد، ١٩٧٩، الصفحات ٤٠-٤١.

**ک و دەوروبەری لەچوارچێوەی کێشەی موسڵدا :-**

**ل مەزهەر ئەحمەد**

ـکرایە کە کەمالییەکانی تورکیا داوای ویلایەتی ن دەکرد، لەسەر ئەو بنەمایەی بەر لە دانوستاندنەکانی ـاوپەیمانان و دەوڵەتی عوسمانی ڕۆژی ٣٠ تشرینی ، ساڵی ١٩١٨، موسڵ لە ڕووی سەربازییەوە لەلایەن یاوە داگیرنەکرابوو، ئەوەش بووە هۆی دروستبوونی ەکی نێودەوڵەتی و لەژێر ناونیشانی (کێشەی موسڵ) ـێژووەوە، ئەوەش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەر کێشەی کەوت لە هەموو ڕوویەکەوە، چونکە کوردستانی ، لە بنەڕەتدا بەشێکی گەورەی دەکەوتە نێو ویلایەتی ی موسڵەوە.

جەر گلاین ئەندامی ئەنجوومەنی گشتی بەریتانییە ، گفتوگۆکانی نێو ڕێڕەوی ئەنجوومەنەکەدا لەسەر ی موسڵ وتی:

ەوەی بووەتە جێی نیگەرانی لەم کێشەیەدا لەسەر اندنی سنوور نییە، وابەستەی مەسەلەی نەتەوە ـتییەکانیش نییە، بەڵکو وابەستەی کێشە گەورەکەی (problem great Kurdish)، هەتاکو کێشەی ش چارەسەر دەبێت، ئەوە ململانێی لەم جۆرە بەردەوام ت دەبێت"[1].

ـنۆڵد نوینبی مێژوو ناسی بەریتانی هەمان شتی تکردەوە[2]، هەر وەک ڕۆژنامەی (تایمز)ی لەندەنیش ـان شێوە کە ڕۆژنامەنووسەکەی لە ڕاپۆرتێکدا ئاماژەی ،، لەدوای ئەوە ڕەوانەی ئیستامبوڵ کرا لە ڕۆژی ٩ی ـی یەکەمی ساڵی ١٩٢٥، تێدا هاتووە:

ـەرچەندە مرۆڤ لەگفتوگۆکانی لەگەڵ هاوڕێیانی تورک ببێتەوە، بۆی دەردەکەوێت کە کێشەی کورد بنەمای ، ململانێکانییەتی، لایەنێکی ئەم کێشەیەش بەدەگمەن نامەگەری کوردیدا چارەسەر دەکرێت، لەکاتێکدا خاڵی ـەری کۆی مەسەلەکەیە"[3] ( لە دەقە ئینگلیزییەکەشدا ە):

(this is really the crux of the whole matte

کرداریش هەرچی لە کێشەی موسڵدا لە سەرەتاوە تاکو ی باسکرا، لە هەموو لایەنە ناکۆکانەوە، دەردەکەوێت ئەوەی باس لە واقیعی کورد و کوردستانی بوونی ک و دەوروبەرەکانی بکرێت، لەکاتێکدا کورد تاکە بوون کە کەس نوێنەرایەتییانی نەکرد لەو ململانێی ییە، هیچ لایەنێکیش کێشەکەیانی بەرجەستە نەکرد ـری لێیان نەکرد.

یەکەم جار کە کێشەی ویلایەتی موسڵ باس کرا، ەم کۆنگرەی لۆزان بوو لە سویسرا، کە کارەکانی لە ٢٠ی تشرینی دووەم لە ساڵی ١٩٢٢ دەستپێکرد ـستی گرێدانی پەیمانی ئاشتەوایی نوێی لەگەڵ تورکیای کەمالی، بۆ ئەوەی ببێتە جێگرەوەی پەیماننامەی سیڤەر، هەر لەدوای شکستی ئاڵوگۆڕکردنی ڕاوبۆچوونەکان لەنێوان لۆرد کیرزن، وەزیری دەرەوە و سەرۆکی وەفدی بەریتانی بۆ کۆنگرەکە و عیسمەت ئینۆنۆ، وەزیری دەرەوە و سەرۆکی وەفدی تورکی، کێشەکە بۆ لیژنەیەکی تایبەتی کۆنگرەکە خرایە ڕوو، ئەوەش لە ڕۆژی ٢٣ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٣.

ئەو بیانووانەی کە هەردوو لا خستیانە ڕوو لەبەردەم کۆنگرەکە، لەبەرژەوەندی واقعی کوردی کەوتەوە لە ویلایەتی موسڵ، جگە لەخودی شاری موسڵ و هەندێک شوێنی ویلایەتەکە، لەنێوان ئەو بیانوانەی کە عیسمەت ئینۆنۆ بە شێوەیەکی تایبەت جەختی لێ دەکردەوە، ئەوە بوو کە نوێنەرانی کورد خۆیان نوێنەرایەتی ویلایەتەکەیان کردووە لە ئەنجوومەنی نیشتمانی گەورە، کە کەمالییەکانی بۆ سەرخستنی بزوتنەوەکەیان پێکیان هێنا، بەڵام سەبارەت بە کەرکوک و دەوروبەرەکەی بە دیاریکراوی، ئەوە هەردوو لا دوو لیستی ئاماریان پێشکەشکرد و تێدا دووپاتیان کردەوە کە کورد زۆرینەیە، لەگەڵ ئەوەشدا لیستەکەی عیسمەت ئینۆنۆ بەراشکاوی لایەنگیری تورکمانی کردبوو لە خەمڵاندنەکانیدا، بەڵام لیستەکەی لۆرد کیرزن و عەرەب پشتگیریان لە کورد کرد سەبارەت بە تەواوی ویلایەتەکە، ئەوەش شتێکی بابەتی نەبوو بۆ کورد، هەردوو حاڵەتەکەش بەشێوەیەکی زۆر هاودژی یەکبوون لەگەڵ ژمارەکانی بەریتانیا و عوسمانییەکانی پێشوو، وەکو ئەوەی لەم توێژینەوەیەشدا[4] بە ووردی دەیخەینە ڕوو، ئەمەش چەند ئامارێکی هەردوو لیستەکەیە کە لە بارەی کەرکوک و دەوروبەرییەوە خرایە ڕوو:

**لیستەکەی عیسمەت ئینۆنۆ:**

کورد ٩٧٠٠٠

تورکمان ٧٩٠٠٠

عەرەب ٨٠٠٠[5]

**لیستەکەی لۆرد کیرزن:**

کورد ٤٥٠٠٠

تورکمان ٣٥٠٠٠

عەرەب ١٠٠٠٠

مەسیحیەکان ٦٠٠

جوولەکە ١٤٠٠[6]

بەڵام لۆرد کیرزن نکوڵی لە زۆرینەی کورد نەکرد بۆ بەشی هەرە زۆری ویلایەتی موسڵ، بەڵام جەختی لەوە کردەوە کە ویلایەتی موسڵ بۆ عێراق بێت لە ڕووی ستراتیژی و ئابوورییەوە[7]، بەڵام کەمالییەکان گرنگی و نیگەرانییان لەسەر لایەنە نەتەوەییەکەی کورد بێت بۆ ویلایەتەکە[8]، هەردوولاش لەسەر ئەم خاڵە زیندەگییە یەکیان گرت، کە خاڵی کوردبوونی زۆربەی ویلایتەکە بوو، بەڵام لە دوو ئاراستەی هاودژیەک بە تەواوەتی و لەپێناو دوو ئامانجی زۆر جیاواز.

کۆنگرەی لۆزان بە ئیمزاکردنی لەنێوان هاوپەیمانان و تورکیا کۆتایی هات لە ڕۆژی چواری تەمووزی ساڵی

١٩٢٣ بەبێ ئەوەی بگەن بە چارەسەرێك بۆ كێشەی موسڵ، بەڵام برگەی دووەمی مادەی سێیەم لە پەیماننامەی لۆزان ئاماژەی بۆ ئەوە كرد كە هێڵێكی سنووری دیاری بكرێت "بە رێكخستنێكی دۆستانە لەنێوان توركیا و بەریتانیای مەزن لە ماوەی نۆ مانگ، ئەگەریش نەگەیشتن بە رێكەوتن ناكۆكییەكان بۆ (عصبة الأمم) بەرز دەكرێتەوە"[٩].

هەر یەك لە توركیا و بەریتانیا هەوڵیاندا چارەسەرێك بۆ ناكۆكییەكانی نێوانیان بدۆزنەوە لە بارەی كێشەی ویلایەتی موسڵ، لە ماوەی ئەو نۆ مانگەی كە پەیماننامەی لۆزان دیاریكرد، بۆیە لە ساڵی ١٩٢٤ لە قوستەنتینییە كۆنگرەیەكیان بەست و تێدا لایەنی توركیا دووبارە بابەتی ئەو نوێنەرە كوردانەی وروژاند كە نوێنەرایەتی موسڵیان دەكرد، بۆیە كۆنگرەكە هیچ دەرئەنجامێكی نەبوو، لە رۆژی پێنجی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٤ ماوەی نۆ مانگەكەش كۆتایی هات، لایەنی بەریتانیش بەپێی پەیماننامەی لۆزان، ناكۆكییەكانی لەبەردەم نەتەوە یەكگرتووەكان خستە روو، لەو چوارچێوەیەدا نەتەوەیەكگرتووەكان لیژنەیەكی پێكهێنا بۆ توێژینەوە لە دۆسێكە و ئامادەكردنی راپۆرتێكی وورد لەبارەیەوە، تاكو نەتەوە یەكگرتووەكان بتوانن لەسەر تیشكی بریارێك بدەن، لیژنەكە پێكهێنرا و ناوی ئەندامانی لیژنەكە لە رۆژی ٣١ تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٢٤ بڵاوكرایەوە، هەر وەك رەچاوی هاوسەنگی نێودەوڵەتیشی تێدا كرا، بۆیە یەكێك لە ئەندامەكان خەڵكی بەلژیكا بووكە هاوپەیمانی بەریتانیا بوو لە جەنگی جیهانی یەكەم و ئەوەی دیكەشیان خەڵكی هەنگاریا بوو كە هاوپەیمانی توركیا بوو، ئەوەی سێیەمیشیان خەڵكی سوید بوو، وەكو لایەنێكی بێ لایەن بوو هەر وەك سەرۆكی لیژنەكەش بوو.

لە رۆژی ١٦ی كانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٥ لیژنەكە گەیشتە عێراق و لە رۆژی ٢٧ی ئەو مانگەوە لیژنەكە دەستی بە كارەكانی كرد لەسەر ویلایەتی موسڵ، هەمان ئەو رۆژە بوو كە لیژنەكە گەیشتنە شاری موسڵ، هاوكات لیژنەكە روویكردە هەولێر و دواتریش كەركوك و سلێمانی و شارەكانی دەوروبەری، لەنێو ویلایەتەكە بەردەوام بوو لە لێكۆڵینەوەكانیدا تاكو كۆتایی ٢٥ی ئادار و دواتر گەرایەوە بۆ ژنێف تاكو راپۆرتەكەی ئامادە بكات.

چەند خاڵێكی جەوهەری هەیە سەبارەت بە بابەتەكە كە پێویستە بە شێوەیەكی تایبەت لەسەری بووەستین، بەر لە هەموو شتێك لایەنی بەریتانی هیچ گرنگییەكی بە ویست و ئارەزووە نەتەوەیەكیان نەدا، لیژنەكەش ئاماژەی بۆ ئەوە كرد كە زۆرینەی هەر زۆری ئەو ناوچانە كوردن كە "ساویلكەن و ناتوانن گوزارشت لە رای خۆیان بكەن"[١٠]، لەكاتێكدا ئادمۆنس كە یاوەری لیژنەكە بوو، تەكیدی كردەوە كە ئەندامەكانی تووشی شۆك بوون كاتێك گوێبیستی وەڵامی ئەو كەسانە دەبوون كە لێكۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەكرا "تەنانەت ئەگەر سیاسی بوایە یان ئابووری"، هەر وەك تێبینی هەمان شتیشیان كردبوو لە كوردەكانی كفری[١١].

لەپێناو روونكردنەوەیەكی بابەتییانەی زیاتر، خوێنەری ئاراستەی دیالۆگێكی قوڵتر دەكەینەوە كە لەنێوان مەلا محەمەد كۆیی (مەلای گەورە) و نێوان ئەندامانی لیژنەكە روویدا لە هەولێر و لە (گۆڤاری كۆمەڵگەی زانستی عێراقی) بڵاوكرایەوە[١٢]، كە بووە هۆی ئەوەی سەرۆكی لیژنەكە بڵێت "ئەم پیاوە شایەنی ئەوەیە ببێتە ئەندامێكی دادگای لاهای، تەنانەت ئەگەر هیچ بروانامەیەكیشی نەبێت".

لەم روانگەیەوە بەریتانییەكان هەموو هەوڵێكی خۆیان خستە گەر بۆ ئەوەی لیژنەكە نەگەن بە نوێنەرە راستەقینەكانی كورد، لە پێشەنگی هەموویشیانەوە شێخ مەحمود، كە یاداشتنامەیەكی ئامادەكرد و چەند كۆپیەكی رەوانەی موسڵ و كەركوك و هەولێر كرد، بەو هیوایەی بگاتە دەست لیژنەكە[١٣].

كاتێك لیژنەكەش گەیشتە سلێمانی لەژێر پاسەوانێكی زۆر توندەوە سەردانەكەیان كرد، پاسەوانییەكەش بریتی بوو لە سەربازە بەریتانییەكان و پۆلیسی عێراقی و پێنج فرۆكەش بەسەر سەریانەوە بوون[١٤]، شێخ ویستی سەرنجی رابكێشێت بۆ لای خۆی و لەسەر چیاكانی گوێژەی سەرووی سلێمانییەوە ئاگری كردەوە، هەر وەك لە دەورووبەری شارەكەش لەچەند شوێن ئاگری كردەوە، بەپێی راپۆرتە هەواڵگرییەكانی بەریتانیاش جەخت لەوەدەكەنەوە كە بەهۆی ئەو ئاگرەوە لیژنەكە نەگەیشتن پێی[١٥].

سەرەرای ئەوەش هەموو ئەوانەی قسەیان لەگەڵ كرد لە ویلایەتەكە بە كوردەكانی كەركوك و دەورووبەریشەوە، جەختی لەسەر گرەنتی پێدانی ماف نەتەوە و گەلەكەیان كردەوە، سەبارەت بە كەركوكیش بەدیاریكراوی لیژنەكە گەیشت بەو دەرئەنجامەی كە مەبەستی گەورەی ئێمەیە و دەمانەوێت چارەسەری بۆ بكەین، هەر وەك ئەندامە بەلژیكییەكە كە ناوی بوڵس بوو و ئەركی دەرخستنی راستییەكانی شاری كەركوكی گرتە ئەستۆ و دوو هەفتەی تەواو تێدا مایەوە، رایگەیاند "ئەگەر بەشێكی زۆری شارەكە تورك بووبن، ئەوە زۆرینەی هەر زۆری دانیشتووانی لیواكە كوردن"[١٦]، هەر وەك راپۆرتی لیژنەكە و بیانووی لایەنی توركی و بەریتانیش كە پێشكەشی لیژنەكەیان كرد جەختیان لەسەر هەمان راستی كردەوە و هیچ جیاوازییەكی نەبوو لەگەڵ ئەو قسانەی كە لە كۆنگەرەی لۆزان پێشكەشیان كرد و لە پێشەنگی ئەو توێژینەوەیەشدا ئاماژەمان بە ووردەكاری دیاریكراو كرد لەسەری، بەڵام راپۆرتی لیژنەكە ئەم راستیانەشی خستە سەر كە پێویستە بەشێوەیەكی جددی رەچاو بكرێت، چونكە بۆ ئامادەكردنی راپۆرتەكە پشتی بە توێژینەوەی مەیدانی و وورد و گەشتكردن بە ئۆتۆمبێل و فرۆكە و پیادە و خشتە كۆنەكانی عەرەب و خشتەكانی ئەورووپا و نووسینی نووسەران و ساڵنامە عوسمانییەكان و نووسینی كۆچەرەكان و كتێبەكانی جوگرافیای خوێندنگەكانی میسر و چەند شوێنی تریش بەست.[١٧]

١- ژمارەی کوردد زۆرینەن لەتەواوی ئەو زەویانەی کە ناکۆکی لەسەرە و عەرەب لەکەناری ڕووباری دیجلەدان و لە شاری موسڵن[١٨].

٢- ئەو گرووپە یەککگرتوانەی کە لەناوچەیەکی فراواندا نیشتەجێی موسڵن تەنیا عەرەب و کوردن، ڕووباری دیجلەش بووەتە سنووری جیاکەرەوەی نێوان هەردوو ڕەگەزەکە، تاکو لە زێی بچووك یەك دەگرنەوە و دواتر بەرەو باشووری کەرکوك . کفری[١٩].

٣- ئەگەر بیانووی نەژادی بووبێتە کاریگەری یەکلایی کەرەوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە لەو کاتەدا، ئەوە پێویستە دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ پێکبهێندرێت، ئەمەش ئەو رایە بوو کە زۆربەی ناوچە کوردییەکان وابەستەی بوون[٢٠].

٤- لیژنەکە ئەوەیان دەرخست کە لەهەر شوێنێکدا چاویان بە کورد کەوتبا، جەختیان لەسەر پێویستی زامنکردنی مافە نەتەوەیەتییەکانیان دەکردەوە، لەحاڵەتێکدا ئەگەر ویلایەتەکە بخرێتە سەر عێراق، ئەگینا ئەوان پێیان باشە بخرێنە سەر تورکیا، لەکاتێکدا لیژنەکە وای دەرخست کە کورد ئارەزووی ئەوە ناکەن لە تورکیا بژێن "وەکو لە شۆرشەکانیاندا سەلمێندراوە"، لەسەر تیشکی بەراورد کردن لەنێوان هەردوو حاڵەتەکە لیژنەکە سوور بوو لەسەر ئەوەی گەرەنتی پێویست پێشکەش بکرێت بۆ پاراستنی مافە نەتەوایەتییەکانی کورد، هەروەها درێژەکردنی ماوەی دەسەڵاتی بەریتانیا لە عێراق، لە حاڵەتێکدا ئەگەر ویلایەتەکە بخرێتە سەر عێراق، بە پێچەوانەشەوە لە دژی ئەوە بوو کە بخرێتە سەر تورکیا، چونکە "دۆخی ناوخۆی و سیاسی لە عێراق جێگیرتر بوو"[٢١]

چەندین لایەن دیکەش هەن لە سەر کێشەی موسڵ و دەرهاویشتەکانی شایەنی وەستانە لەسەری، لەچوارچێوەی پەیوەندییەکانی بە کەرکوك و دەورووبەری، بەر لە هەموو شتێکیش، کێشەکە مشتومری زۆری لەنێو ڕێرەوەکانی ئەنجوومەنی دامەزراندنی عێراقی وروورژاند، بەو پێیەی یەکەم دەسەڵاتی تەشریعی بوو لە وڵاتەکەدا، کە تێدا تەواوی نوێنەرە کوردەکان، جگە لە ئیسحاق ئەفرایم کە نوێنەرایەتی سەرجەم جولەکەکانی ویلایەتی موسڵی دەکرد لە دانیشتنی بیستەمینی ئەنجوومەنەکە، کە لە ڕۆژی سێشەمەی ٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٤ ئەنجامدرا، لە ڕێگەی نوێنەری بەغدا شێخ ئەحمەدی داودەوە، کە چالاکییەکی زۆری نواند بۆ بەرگری کردن لە ماف عێراق لەسەر ویلایەتی موسڵ، تێدا ویستی خۆی دەربڕی لەسەر:

"نوێنەرانی کەرکوك و هەولێر بەشدار بن لە بڕیاردان و لەم ڕۆژە قورسەدا بەجێمان نەهێڵن لە بەرگریکردنی سیاسی لەسەر موسڵ"[٢٢].

بەشداریکردنی ئەندامەکانی ئەنجوومەنی دامەزراندن لەسەر بڕیاردانێکی گشتی، نەتەوەیی عەرەبیی تێپەڕاند بۆ کوردستانی بوونی کەرکوك و دەورووبەرەکەی، هەر لە هەمان دانیشتندا ئەمجەد ئەلعامری نوێنەری موسڵ، کاتێك باسی موسڵی کرد، تەنیا مەبەستی موسڵ نەبوو، بەڵکو "کەرکوك و هەولێر و سلێمانی و تەواوی قەزا و ناحییە کوردەییەکانیشی کرد"[٢٣]. لە دانیشتنی بیست و سێهەمیندا کە لە نۆی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٤دا ئەنجامدرا، وەزیری ناوخۆ داوای لە عەلی جەودەت ئەیوبی کرد کە نوێنەری موسڵ و یەکێك بوو لە گەورە سیاسییەکانی سەردەمی پادشایی[٢٤]، کە "ناوەندی عێراق بەهێز بکرێت لە دانوستاندن لەسەر سنوور، بەهۆی بوونی نوێنەری شاری موسڵ و کوردستان"[٢٥].

ئەمەش واتای ئەوەیە کە ئەم وەزیرە موسڵی لە کوردستان جیا نەکردەوە، لە هەموویشی گرنگتر ئەوەیە کە نوێنەری کەرکوك و هەولێر بە تەنیا لەنێوان هەموو نوێنەرەکانی تر، یاداشتی تایبەتیان پێشکەش کرد بۆ ئەنجوومەنەکە لەکاتی گفتوگۆکان بۆ کێشەی موسڵ و تێدا داوایان کرد ماف کورد بپارێزرێت[٢٦].

لەکاتی یەکلاییکردنەوەی کێشەی موسڵ بابەتەی خوێندن بە زمانی کوردی خرایە ڕوو لە بەردەم ئەنجوومەنی دامەزراندن، ئەوەش بە ڕۆحێکی دیموکراتییانەی ڕوونەوە بوو[٢٧]، لەو کاتەدا ئەنجوومەنەکە کەرکوکی لە کوردستان جیانەکردەوە، بەڵکو جەختی لەسەر چەند ڕاستییەکی گرنگ کردەوە و وەکو بڕیارێکی مێژوویی ڕوونە لەلایەن یەکەم دەسەڵاتی تەشریعی عێراقییەوە، هەروەك لە دانیشتنی بیستوشەشەمیندا کە لە ڕۆژی دووشەمەی ١٦ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٤ ئەنجامدرا، دیارترین دامەزرێنەرانی دەوڵەتی عێراقی نوێ و سەرۆکی ئەنجوومەنی دامەزراندن و نوێنەری بەسرە عەبدولموحسن ئەلسەعدون قسەی لەسەر ئەم بابەتە گرنگە کرد و بە وردەکاری تەواوەوە وتی:-

"لای هەموو هەڤاڵانم ڕوونە کە گەورەترین هۆکار بۆ کەوتنی حکوومەتی عوسمانی، بۆ قۆستنەوەی سنووی نەتەوەکان و پێشێلکردنی ماف تایفەکان دەگەڕێتەوە کە لەژێر ئاڵاکەی عوسمانییەکاندا بوو، ئەگەر ئێمە بەهەمان شێوە لەسەر شێوازی تورکییەکان بڕۆین و ماف نەتەوەکانی پێشێل بکەین، کەواتە بەهەمان شێوەی هەڵەکەی ئەوان ئێمەش هەڵە دەکەین، بۆیە بە پێویستی دەزانم، ئازاد بین و ئازادی بەهەموو تاکێك بدەین (چەپڵەلێدان) دەبێ پابەند بین و کەمتەرخەم نەبین لە پێدانی ماف بۆ خاوەن ماف، ئەوەشی ڕوونە کە لە عێراقدا لایەنێکی مەزن هەیە ئەویش لایەنی کوردییە، ئەگەر ماف بە لایەنی کوردی نەدەین و ڕێگە بە خوێندنگەکانی نەدەین کە بە زمانی کوردی بخوێنن، ئەوە دەرئەنجامەکەی لەوانەیە خراپ بێت، هیوادارم ئەنجوومەنەکە کەمتەرخەم نەبێت لە پێدانی ئەم مافە، تاکو دڵەکان یەککگرتوو بن"[٢٨].

بۆ بەدواداچوون لەسەر قسەکانی عەبدولموحسن سەعدون کە لە ئەنجوومەنەکەدا بە چەپڵەلێدان پێشوازی لێکرا، ئەمجەد عومەری نوێنەری موسڵ چەند ڕاستییەکی گرنگی ڕوون کردەوە لەسەر تیشکی ئەزموونە کردارەکانی و مامەڵەی ڕاستەوخۆی لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە و وتی:

"تایە جیاوازەکان تەنانەت ئەگەر لە کوردەکان بن یاخود لایەنەکانی تری غەیرە موسڵمان، پێویستە دەریان بخەین و لایەنی عەرەبییان لەلا خۆشەویست بکەین بۆ ئەوەی عێراق لایەنەکانی یەککگرتوو بێت لەچوارچێوەی خۆشەویستییەکی

گەرم، نەك وەکو کاتی دەوڵەتی تورکی، ئەگەر بمانەوێت پشتیوانی براکانمان لەدانیشتووانی هەولێر و کەرکوك و سلێمانی بەدەست بێنین، پێویستە لەم بابەتەدا هاوکاریان بین و ئەگەر بمانەوێت بە زمانێك بخوێنن جیاواز لە زمانە رەسەنەکەیان، ئەوە دووچار ماندوویان دەکەین، جارێك بۆ زمانەکە و جارێکیش بۆ فێربوون، کاتێك مامۆستابووم لە سەردەمی حکوومەتی تورکیدا، لە (دارولموعەلمین) وانەی حیکمەتی سروشتی (فیزیك)م دەگووتەوە، ناچار دەبووم لە رێگەی خوێندکارێکی کورد کە هەردوو زمانی تورکی (بۆ خوێندن) و کوردی دەزانن وانەکە بڵێمەوە، چونکە ئەو زانستەی من دەمگووتەوە زۆر وورد بوو، هەروەك ئاگاداری دەرئەنجامی چەندین ئەزموون بووم، بەوەی ئاسانترین شێواز بۆ خوێندنی مرۆڤ لە رێگەی زمانەکەی خۆیەتی، بۆیە پێویستە لەسەر میتۆدی حکوومەتی تورکی نەچین و دەبێت دڵی کوردەکان بۆ خۆمان رابکێشین"، وتیشی "پێشم وایە ئەوان فێری عەرەبی دەبن، چونکە خۆشیان دەوێت و تایبەتمەندییەکانی دەزانن، لە شاری کەرکوکیش ناتوانرێت ئەندازیاری بە عەرەبی بوترێتەوە، چونکە ئەو شارە عێراقییە و پێویستە وابەستەی خۆشەویستی و دۆستایەتی ببێت، نەك بە زەبری هێز و قەدەغەکردنی زمانەکان"[٢٩]، بەڵام یوسف غەنیمە پەرلەمانتاری سەر بە بەغداد پێی وابوو "دانپێدانان بە زمانی کوردی بە شێوەیەکی رەسمی کارێکی یاساییە و مەرجێکە لە مەرجەکانی (ئازادی گشتی)، بە تایبەتی کە ئێمە دەمانەوێت حکوومەتێکی دیموکراتی دابمەزرێنین"[٣٠]

بۆ وەڵامدانەوەی وتەی ئەو دانیشتنانەی ئەنجوومەنی دامەزراندنی عێراقی و بۆ گوزارشتکردن لە هەستی کورد، مەلا محەمەد کۆیی وتەیەکی کورتی پێشکەش کرد و بە چەپڵەیەکی گەرمەوە پێشوازی لێکرا و بەهۆی گرنگی وتەکەیەوە، دەقەکەی دەخەینە روو:

"بەهای شاری موسڵمان زانی بە سەرجەم پاشکۆکانییەوە، ئەوەش لە دیوێکی تەرازووەکە دانراو[٣١] و پەیماننامەکەش لە دیوێکی دیکەدا دانرا، ئەوەی روونە بۆتان ئەوەیە کە کورد کەمینە نییە، وەکو بینیتان نوێنەرە کوردەکان لەلای سەرۆك و لای ئێوە سکاڵایان پێشکەشکرد، چونکە زمانی عەرەبی بە باشی تێناگەن، داواکارییەکی زۆری کوردەکانیش لە دڵیان مایەوە، چونکە کەس لێیان تێنەگەیشت و کەس نەیتوانی رایبگەیەنێت، چاوەروانین لە برا عەرەبەکانمان رێزمان لێ بگرن، وەکو چۆن ئێمە رێزمان لێیان گرت (چەپڵە) ئەم بیرۆکەیەش لەوەدایە کە مانەوەی نەتەوەیەك بە مانەوەی زمانییەوە بەستراوە، گەلی کوردیش لە هەموو گەلەکانی دیکەی جیهان گرنگی و پێگەی مەزنی زمانی عەرەبی دەزانێت، چونکە وابەستەی بنەمای ئایینە و زمانێکی شەریفە و ناشتوانرێت تایبەتمەندییەکانی بیژێردرێت، بەڵام زمانی کوردیش بەهای خۆی هەیە، هۆکاری بڵاونەبوونەوەشی بۆ پێشنەکەوتنی کورد دەگەرێتەوە، هەر وەك حاجی قادر[٣٢] دەڵێت (بەلاغەت و زمان پاراوی زمانی کوردی بە عەرەبی دەچێت، بەڵام پێشنەکەوتنی کورد وای لێکرد کە بنەمای نەبێت، بۆیە تکا دەکەین هاوکاریمان بکەن لەم مادە رۆحییەدا، هیچ قەومێك نافەوتێت تەنیا بە فەوتانی زمانەکەی نەبێت، پەیوەندییە کۆنەکەشم هەتا رۆژی هەستانەوە دەمێنێتەوە"[٣٣].

جێی ئاماژە بۆ کردنە حوسێن جەمیل سیاسەتمەداری عێراقی ناسراو، کرۆکی دانیشتنی ٢٦ی ئەنجوومەنی دامەزراندن گواستەوە و بە (شایەدی سیاسی وەسفی کرد). لە بارەی (مافەکانی نەتەوەی کورد و مافی خوێندنی کوردی لە خوێندنگەکانیان)[٣٤]

هەر لەو چوارچێوەیەدا خاڵێکی گرنگ ماوەتەوە و شایەنی ئاماژە بۆ کردنە لەو چوارچێوە مێژووییە راستەقینەکەی، ئەوەش ئەوەیە کە کورد رۆڵێکی یەکلاییکەرەوەیان گێرا بۆ بریاردان لەسەر چارەنووسی ویلایەتی موسڵ لە بەرژەوەندی عێراق، ئەم وتەیە لەسەر کوردی کەرکوك و دەرەوبەرەکەشی جێبەجێدەکرێت[٣٥]، هەر وەك مەغزایەکی قوڵیشی لەدوو توێیدایە، بە تایبەتی ئەگەر رەچاوی ئەوە بکەین کە بەهێزترین بەرەنگاربوونەوە لە کەرکوك روویدا، بەڵکو خودی لیژنەکەش تووشی شۆك بوون بەوەی ژمارەیەکی زۆری عەرەبی دەوروبەری کەرکوك، دەنگیان بۆ ئەوە دا کە بچنە چوارچێوەی حکوومەتی تورکیاوە[٣٦]، هەروەك چەندین خێزانی عەرەبی بەناوبانگی شاری موسڵیش لەگەرمەی ناکۆکییەکاندا لەگەڵ ئەوەدان بوون کە بچنە چوارچێوەی تورکیاوە.

لەچوارچێوەی هەڵوێستی کورددا بە پێویستی دەزانین کە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ژمارەیەك لە رۆشنبیرانی کوردستان (کۆمەڵەی کوردی)یان دامەزراند و پشتیوانییەکی زۆریشی لەو لایەنانەوە لێکرا کە بێزار بوون لە سیاسەتە کەمالییە شۆڤینییەکان بەرانبەر بە کورد بە گشتی، ناوەندی گشتی کۆمەڵەکە یاداشتێکی درێژیان بەرزکردەوە بە ژمارە ٧١٩ و لە بەرواری یەکی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٤، بۆ ئەنجوومەنی (عصبة الأمم) تێدا چەندین زانیاری خرایە روو لە بارەی ئیدعاکانی لایەنی تورکی و بیانوەکانی سەبارەت بە پەیوەندییە نەتەوەیی و زمانەوانییەکانی نێوان کورد و تورك، ئەو کارەی کە تورکیا گرەوی زۆری لەسەر دەکرد لەپێناو قایل کردنی لایەنە نێودەوڵەتییەکان و (عصبة الأمم) بۆ ئەوەی رەزامەندی وەربگرێت بۆ ئەوەی موسڵ بخرێتە چوارچێوەی تورکیاوە، وەکو روونیشە لە توێیەکانی راپۆرتی لیژنە و یاداشتەکانی (عصبة) و کۆنگرەی لۆزان، یاداشتەکە کە لەنێوەندە سیاسییەکان و رۆژنامەوانییەکانی عێراقیدا گرنگی زۆری پێدرا، تێدا هاتبوو:

"لە سەردەمێکدا کە (عصبة الأمم) داوای یەکلاییکردنەوەی چارەنووسی موسڵ دەکات بە شێوەیەکی کۆتایی، کۆمەڵەی کوردی بە ئەرکی خۆی دەزانێت دەنگی ئەو وڵاتە دوورە بگەیەنێت پێتان هەرچەندە ئەو دەنگە لاوازە و لەجیهانی پێشکەوتوودا لەوانەیە نەبیسترێت، بەڵام کۆمەڵەکەمان بە رووی تورکەکان وەستانەوە کە داوای ئەوە دەکەن حوکمی ئەو وڵاتە بکەن کە تازە لەدەستی ستەم و زۆرداری ئازادکراون، هەر وەکو کۆمەڵەکەمان بەردەوامە لە وەستانەوە بە روویان، چونکە کۆمەڵەکەمان

بۆ بەرگریکردن لە بەرژەوەندی نەتەوەی کورد دامەزراوە و بە توندی داواکارییەکانی ئەنقەرە ڕەتدەکەینەوە بەوەی ویلایەتی موسڵ بکەوێتە ژێر دەستی ئەوان، چونکە زۆربەی دانیشتووانی ئەم ویلایەتە کوردە... بەهێزترین بنەماش کە حکوومەتی ئەنقەرە دەستی پێوەگرتووە بۆ ئەوەی بیکاتە بیانووی بۆ وەرگرتنی ویلایەتی موسڵ بریتییە لە هاوبەشی تورك و کورد لە ئاین و نەژادییەوە، لە ڕاستیدا ئەم قسانە جێی قبووڵ نییە و جێی باوەڕیش نییە لەلای کورد، چونکە کورد باش دەزانن کە هیچ پەوەندییەکیان بە تورکەوە نییە لە ڕووی دامەزراندن و زمانەوە و بەهەموو شێوەیەك جیاوازن لە ڕووی نەژادی تورکی زمانەکەیانەوە... هەروەك گەڕانەوەی ئیدارەی تورکیا بۆ سەر موسڵ تاوانێکی گەورەیە بەرانبەر بە ماف گەلەکان بە شێوەیەکی گشتی و زیان بەخشیشە بۆ کورد بە تایبەتی، ئەو کوردانە ماف ئەوەیان هەیە ژیانێکی باش بۆخۆیان هەڵبژێرن، بە گەڕانەوەی موسڵیش بۆ تورکەکان بێگومان دەبێتە هۆی بەردەوامی ناکۆکییەکان و دەرئەنجامی خراپی لێدەکەوێتەوە، ئێمەش هیوای گەورەمان هەیە بەوەی (عصبة الأمم) بە ئەنجوومەنەکەیەوە بەرەو ئەو ئاراستەیە نامان بات، هەر وەك ئەو کارە دوورە لە بنەما و پرەنسیپەکانی دادپەروەری کە ڕاستی مایەی هێزەکەیەتی، بەهەموو شێوەیەکیش داواکاری تورکەکان ڕەتدەکاتەوە.. ئەم تەدبیرەش سنوورێکی کۆتایی بۆ تەماحی تورکەکان دیاری دەکات و شاری موسڵیش کە مۆرکێکی کوردی ڕوونی هەیە لەدەست ئیدارە ڕەشەکەی تورك ڕزگار دەکات، (عصبة)ی کوردیش بە شەرەف دەزانێت ئەم یاداشتە بخاتە بەر دیدی دەستەی دادپەروەر، کە دادپەروەری حەق دەکات لەنێوان گەلەکان و بۆ ئەوەی دۆخی دژواری کوردەکان دەربخات کە ناچارکراون ملکەچی ئیدارەی تورك بن، بەهیواین (عصبە الأمم) بتوانێت ڕێوشوێنی پێویست بگرێتە بەر بۆ ئەوە زامنی ژیانێکی ئازاد بکات بۆ کورد و بەخێرایی ستەمی سەر نەتەوەی کوردی بۆ ئاشکرا ببێت، بەم شێوەیەیش لەوانەیە بتوانرێت ئەو بۆشاییانە پڕبکرێتەوە کە پەیماننامەی لۆزان بەمەبەست دۆسێی کوردی فەرامۆش کرد، بۆیە بە ناوی دادپەروەری و بەناوی ماف پیرۆزی گەلەکانەوە و بەناوی مەدەنییەتەوە، کۆمەڵەی کوردی داوای هاوکاری دادگای دادی گەورە دەکات دۆخی گەلێکی لەبیرکراو باش بکات کە بەزەبری هێز حوکم دەکرێت و تەنانەت کە ئازادییەکەشیان لێ وەرگرت توانی ببێتە لایەنێك کە خزمەت بە ئاشتی و پێشکەوتن بکەن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست".

ئەم یاداشتنامەیە دەنگدانەوەیەکی گەورەی لە نێوەندە سیاسییە عێراقییەکان دایەوە، بە تایبەتی لە نێو گرووپەکانی نەتەوەیی عەرەبیدا کە بەڵگەیەکی ڕوونیان تێدا بەدی کرد بۆ پۆچەڵکردنەوەی تەواوی ئیدیعاکانی لایەنی تورکی، ڕۆژنامەی (الاستقلال) کە عەبدولغەفوور ئەلبەدری بەڕێوەی دەبرد و قاسم عەلەوی سەرنووسەری بوو، لەشوێنێکی دیاریکراودا بڵاوی کردەوە[٣٧]. هەروەك ڕۆژنامەی (العالم العربي) کە ڕۆژنامەیەکی بەربڵاوبوو بەهەمان شێوە دەقەکەیان بڵاوکردەوە[٣٨]. هەروەك دکتۆر فازڵ حوسێن بۆ خوێندنی ئەکادیمی لەبارەی کێشەی موسڵ پشتی بە ناوەڕۆکە گشتییەکەی یاداشتەکە بەست، بۆ دیاریکردنی هەڵوێستی کورد لە بابەتێکدا[٣٩]. بەڵام (حزب الأمة) یاداشتەکەی وەکو پاشکۆیەکی بۆ ڕاپۆرتەکەی بەناوی (لەبارەی کێشەی موسڵ) بەکار هێنا، کە "دەستەی ناوەندی حزب بۆ لیژنەی سنوور بەرزیکردبووەوە و (عصبە الأمم)، ڕاسپێردرابوو بۆ چارەسەرکردنی سنووری نێوان هەردوو دەوڵەتی عێراق و تورکیا"، ئەو حیزبە کە چەند قەومییەکی عەرەب دایانمەزراندن بۆ بەرگریکردن لە (ماف عێراق لەویلایەتی موسڵ)، هاوشێوەی ناجی سویدی و قاسم عەلەوی و عەلی مەحمود شێخی پارێزەر و ئیبراهیم ناجی پارێزەر و چەندین تر[٤٠]. حیزبەکە بەشێوەیەکی تایبەت جەختی لەسەر گرنگی یاداشتی (کۆمەڵەی کورد) کردەوە[٤١]، کە ئاماری ویلایەتی موسڵیشی لەخۆ گرتبوو و بە ڕوونی مۆرکی کوردبوونی کەرکوك و دەوروبەری تێدا دەرخستبوو.

هەر بەو بۆنەیەوە بە پێویستی دەزانین ئاماژە بۆ یوسف ئەلحاج ئەلیاسی پارێزەی بکەین، کە دامەزرێنەرانی (حزب الأمة) بوو وەکو باسمان کرد، کە دواتر بوو بە یەکێك لە جەمسەرەکانی (پارتی نیشتمانی دیموکراتی) چالاك، جەختیان لەسەر نەتەوەی عەرەب دەکردەوە و لە ڕاستیدا لەئاست تێگەیشتنیان بۆ ڕەهەندی کێشەی کورد نەبوو وەکو پێویست لەو قۆناغە هەستیارەی مێژووی عێراق، تەنانەت هەڵوێستەکەیان لەوە زیاتر تێنەپەڕی کە هەندێك دروشمی هاوسۆزی بۆ قۆناغە بەرزبکەنەوە، دواتریش دامەزرێنەرانی (حزب الأمة) هەڵوێستی شۆڤێنی و توندڕەویان لە ئاست کورد و مافە ڕەواکانیان گرتە بەر[٤٢].

لەچوارچێوەی ململانێکانی لەسەر چارەنووسی ویلایەتی موسڵ کورد چەندین هەڵوێستی دیکەیان گرتە بەر کە سەرجەمیان لە بەرژەوەندی عێراق بوون، کوردی کەرکوك و سلێمانی و "سەرجەم عەشیرەتە کوردییەکانی دانیشتووی ویلایەتی موسڵ" و خەڵکی "٣٠٠ گوندی چیا بەرزەکانی سەر بە ڕەواندوز، کە پێشتر ناوەندی ئیمارەتی کورد بوو و بەر لە حەفتا ساڵ تورکەکان دەستیان بەسەردا گرت"، و کوردەکانی عەقرە" و "شێخەکانی دهۆك و عیمادییە" و "عەلەمدار زادە عەبدولڕەحمان لەسەر کەرکوکییەکان" هاتنە دەنگ و "لقی کۆمەڵەی بەرگری لە زاخۆ"، لەگەڵ لقێکی دیکەی لە دهۆك و پیاوماقوڵانی هەولێر و چەندینی تر، هەر وەك دەیان بروسکە و یاداشتنامە بۆ لیژنەی لێکۆڵینەوە، یاخود (عصبة الأمم) بەرزکرایەوە و جەختیان لەوە دەکردەوە کە ئارەزووی ژیان دەکەن لە چوارچێوەی عێراقدا، بەو پێیەی "یاسا بنەڕەتییەکەی زامنی مافە نەتەوایەتییەکانیان دەکات"[٤٣]. جێی ئاماژەیە ڕۆژنامەکانی بەغدا زیاتر لە جارێك وێنەی هەندێك لە بروسکە و یاداشتنامەکانی بڵاوکردەوە بۆ ئەوەی بە بەڵگەی سەلمێندراو بیخاتە بەرژەوەندی عێراقەوە[٤٤].

هەر لەو چوارچێوەیەدا مەعروف چیاوك دادوەر و پەرلەمانتار و ڕۆشنبیر و کەسایەتی کۆمەڵایەتی کوردی بەناوبانگ، کە یەکێك بوو لە توندترین خوازیارانی ئیسلام

و برایەتی عەرەب و کورد، زنجیرەیەك وتاری لەسەر هەمان بابەت لە لاپەرەکانی (المفید) بڵاوکردەوە کە ئیبراهیم حلمی ئەلعەمر لە بەغدا بڵاویدەکردەوە، هەر وەك "بەشێوەیەك سەرسووڕهێنەر بووە هاندەرێك بۆ بەرێکردنی بزوتنەوەی نیشتمانی"(٤٥). جیاوك لە وتارەکانیدا کە بە ناونیشانی (کوردەکان و سنووری عێراق) بڵاویدەکردەوە، هەموو بیانووی کەمالییەکانی پووچەڵکردەوە و "سەرنجی لیژنەی لێکۆڵینەوەی" بۆ کێشە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و مێژوویە گرنگەکان ڕاکێشا(٤٦). بۆیە خاوە (چاپخانەی ئیستقلال)ی بەغدادی بە پەلە هەموو وتارەکانی لە کتێبێکدا کۆکردەوە و لە ژێر ناونیشانی (کێشەی کورد) لەسەر ئەرکی چاپخانەکەی بڵاویکردەوە(٤٧).

ئەم هەڵوێستی کورد لەدەرەوەی وڵاتیش دەنگدانەوەی هەبوو و ڕۆڵیشی هەبوو لەسەر لاوازکردنی هەڵوێستی تورکیا، بەپێی زانیارییەکان ڕۆژنامەگەری ئینگلیزیش گرنگی پێدا، بەهەمان شێوەش بۆ ڕۆژنامە عەرەبییە غەیرە عێراقییەکانیش بە شێوەیەکی ڕوون گرنگییان پێدا، وەکو لە ڕۆژنامەی (ئەلموقتەم)ی میسری وتارێکی لەژێر ناونیشانی (الاکراد و العراق) بڵاوکردەوە و تێدا وتی:

"هیچ گۆڕانکارییەك لە مەسەلەی موسڵ ڕوویندەدا، جگە لەوەی کە بەم دواییە ڕۆیتەرز باسی لەوەکرد کە سەرکردە و عەشیرەتەکانی کوردی ئەم ویلایەتە بە ناوی سەرجەم عەشیرەتە کوردییەکان، نارەزایەتی توندی لەدژی بانگەشەی تورکەکان، کوردەکان ڕاشیانگەیاند کە تورکیا لە ڕووی ئابووری و ڕەگەزیشەوە ماف بە ویلایەتی موسڵەوە نییە ... هەرچۆنێك بێت ئەو نارەزایەتیانەی کە کورد ناردوونی بیانووەکەی تورك لاواز دەکاتەوە کە دەڵێت کورد وابەستەی تورکە و گوایە لەدەست حوکمی عێراق هەڵدێن و کاریگەری خراپ و گەورەیان لەسەر بەڕێوەچوونی ئەو دۆسێیە دەبێت، چونکە کورد بەشی هەرە زۆری دانیشتووانی ئەم ویلایەتییە، ئەوان بەشێکی زۆری باکووری عێراق پێکدێنن، وەکو چۆن عەرەبیش بەشێکی زۆری باشوور و ڕۆژئاوا پێکدێنن، تورکەکانیش کەمینەیەکی زۆر کەمن و هیچ حیسابێکیان بۆ ناکرێت و کێشەشیان نابێت لەبڕیاردان لەسەر کێشە چارەنووسازەکان، چونکە میللەتەکان بەپێی زۆرینە بەڕێوەدەبرێ نەك کەمینەکان، وەکو ڕوونیشە ئێمە بزوتنەوەی کورد وەکو بەڵگەیەك دەبینین بۆ لێکتێگەیشتن و ڕێکەوتنی نێوان عەرەبی عێراق و کوردەکانی کە ساڵانێکی دوور و درێژ پێکەوە بە ئاشتیی و تەبایی ژیاون"(٤٨).

مەترسیدارترین هەڵوێستی کورد کە ڕۆڵی یەکلاییکەرەوەی بینی لەسەر چارەنووسی ویلایەتی موسڵ خۆی لە ڕاپەڕینە فراوانەکەی کوردستانی تورکیا بینی بە سەرکردایەتی شێخ سەعیدی پیران و ڕۆشنبیران و بەدرخانییەکان و شەمزینییەکان و دکتۆر فوئاد لە شوباتی ١٩٢٥(٤٩).

ئەم ڕاپەڕینە مانای ئەوە بوو کە هەر زۆر بە سادەیی تورکیای کەمالی بەهۆکاری نەتەوەیی و ئاینییەوە لە چاوی کورددا بەهەموو شێوەیەك ڕەتکراوەتەوە، ئەمەش کاریگەری ڕوونی لەسەر ڕای گشتی جیهانی دروست کرد، بە تایبەتی ڕۆژنامەگەرییەکانی ڕۆژئاوا کە گرنگی زۆری بە ڕووداو و دەرئەنجامەکانی دا(٥٠)، ئەمەش کارێکی سروشتی بوو کە کاریگەری لەسەر ڕای لیژنەی لێکۆڵینەوە و نێو ڕێزەوەکانی (عصبة الأمم) هەبێت، بە تایبەتی ئەگەر ڕەچاوی ئەو ڕاستییە بکەین کە لیژنەکە تازە ئامادەکاری بۆ ئامادەکردنی ڕاپۆرتەکەی دەکرد بۆ ئەنجوومەنی (عصبة).

بۆ بەڵگەی زیاتر لەسەر قسەکانمان، چەند وتەیەکی (لیوبۆلد ئیمری) وەزیری موستەعمەرات و ڕاسپێردراوەکانی بەریتانیا لە ئەنجوومەنی (العصبة) دەهێنینەوە لەسەر ئەم بابەتە کە لە بەردەم ئەنجوومەندا و لە لوتکەی گفتوگۆکان لەسەر یەکلاییکردنەوەی چارەنووسی ویلایەتەکە وتی:

"بەیاننامە تورکییەکە لەسەرەتاوە تاکو کۆتایی بە شێوەیەکی تایبەت جەختی لە سەر ئەوە دەکردەوە، کە بەهۆی ژمارەیەکی زۆری کورد هەن لە تورکیا، ئەوە مانای ئەوەیە کە کوردانی عێراق دەیانەوێت بخرێنە سەر تورکیا و داوای لە ئەنجوومەن کرد کە شۆڕشی کوردەکانی تورکیا هەڵسەنگێنێت، چونکە هاندانێکە بۆ ئەوەی کوردانی دەرەوەی تورکیا بگەڕێنەوە ژێر دەسەڵاتی حوکمی تورکی، هەر وەك هەستی خۆشیان دەردەبرن بۆ حکوومەتی تورکیا لەدژی گەلێك کە لە ڕەگەزی خۆیانە"(٥١).

لێرەدا ئەوە دەسەلمێندرێت کە دکتۆر فازڵ حوسێن تایبەتمەندی یەکەم لە مێژووی کێشەی موسڵ، زۆر ڕاستی کردووە کاتێك ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە ڕاپەڕینی کوردستانی تورکیا کاریگەری لەسەر چارەنووسی ویلایەتی موسڵ کردووە:

"شۆڕشی کوردی ڕووداوێکی شووم بوو بۆ تورکیا، لەکاتێکدا بڕیاری لەسەر یەکلاییکردنەوەی ویلایەتی موسڵ دەکرد کە زۆرینەیان کوردن"(٥٢).

ڕۆژنامەکانی عێراق گرنگیان بە ڕاپەڕینەکەی کوردستانی تورکیا دا و وردەکارییەکانی بە وردی بڵاودەکردەوە و دەیانکردە مانشێتی لاپەرەکانیان و لەلاپەرەکانی دیکەشیدا شوێنی تایبەتیان بۆی تەرخان دەکرد(٥٣)، ئەوەشیان وەکو بیانویەکی دیکە دەگرتە خۆ بۆ ئەوەی تەئکید لەسەر زەرووەتی پێدانی موسڵ بە عێراق(٥٤). هاوکات ڕۆژئاواش بەهەمان شێوە ڕاپەڕینەکەیان قۆستەوە بۆ ئەوەی بانگەشە بۆ ئەوەی ویلایەتەکە بخەنە سەر عێراق(٥٥).

کوردەکان باجێکی قورسیان بۆ ئەو هەڵوێستە دا، مستەفا کەمال ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعیدی وەکو چەقۆیەکی سەخت لەقەڵەم دا کە لە پشتییەوە لێدرابێت و بووە هۆی شەرمەزارییەکی مێژوویی بۆ ڕژێمەکەی، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی تووڕەییەکەی خۆی بڕژێنێتە سەر کوردەکان، ئەوەش لەدوای ئەوەی یەکەم سەرکردەی شۆڕشگێڕ بوو کە دانی بە ماف کورددا بەوەی بینە خاوەن دەسەڵاتێکی ئۆتۆنۆمی، لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٣، هەر وەك دەقەکەشی لە

گۆڤاری (نحو عام الفين)ی تورکی بڵاوکرایەوە لە ساڵی ١٩٨٨[٥٦]. بەڵام قەدەر وابوو کە ئەم راستییە ساویلکەیەی کە لەسەر زەمانەکاندا بووە کوردی عێراقی پێ دەمکوت دەکرد و تورکیایان وەکو فیردەوس وەسف دەکرد و عێراقیان بە دۆزەخ ناودەبرد و بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر جەختیان لەو قسانە دەکردەوە.

جێ ئاماژە بۆ کردنە قسە لەسەر دەستەواژەی (تورکەکانی شاخ) بکەین، کە لە نێوەندە شۆڤێنییەکانی تورکیا بڵاوبووەوە لەدوای راپەڕینی کوردەکان بەسەرکردایەتی شێخ سەعید لە ساڵی ١٩٢٥، ئەم دەستەواژە نامۆیەی رۆحی سەدەم، کە بۆ چەندین نووسەر و رۆشنبیری عەرەب و کورد بەکار دەهێنرا بە بەردەوامی و دووریش نییە تاکو ئەمرۆش بەکاری بهێنن.

ئێمە کە قسە لەسەر ئەم بابەتە دەکەین پێویستیشە ئاماژە بۆ راپەڕینەکەی شێخ سەعید بکەین کە بووە جێی نیگەرانی بۆ تورکمانی کەرکوك و دەوروبەری، چونکە زۆر سەرسام بوون بە ئەتاتورك و بەسەرکردەیەکی نیشتمانیان لەقەڵەم دەدا، هەروەك ئەتاتورکیش ببووە جێی نیگەرانی بۆ کوردی عێراق، بۆیە هەردوو کارەکە بووە هۆی کاریگەری نەگەتیڤ لەسەر پەیوەندییەکانی هەردوولا کە پێشتر تەبایی لەنێوانیان بوو.

شێخ مەحمود و پشتیوانانی دەیانتوانی لە کوردستانی عێراق راپەڕینێکی هاوشێوەی راپەڕینەکەی تورکیا بەرپا بکەین لە هەستیارترین رۆژەکانی یەکلاییکردنەوەی چارەنووسی ویلایەتی موسڵ، بەڵام هەوڵەکانی شێخ مەحمود تەنیا لە رێگەی ئاشتیانەوە بوو، مەبەستیشی زامنکردنی ماڤی نەتەوەی کورد بوو لەچوارچێوەی دۆخەکە بۆ ئەوەی ویلایەتی موسڵ چارەسەر ببێت، پێشتریش ئاماژەمان بۆ هەڵوێستی شێخ کرد و ئەمەشی دەخەینە سەر کە شێخ قادر برای شێخ مەحمود و ژمارەیەك لە پشتیوانانی شێخ لەو کەسانە بوون کە لیژنەی لێکۆڵینەوە قسەیان لەگەڵ کردن لە سلێمانی، بەپێی قسەی شایەد حاڵەکان "بەرۆحێکی بەرزی خەباتگێرانەوە قسەیان کردووە و کارەکەش بۆ ئەوان بەو شێوەیە نەبووە کە بەزەلیلی قایل ببوبن بۆ لێکۆڵینەوە و بەو شێوەیەش نەبووە کە وەڵامی نهێنی و لاوەکیان هەبێت بەڵکو کارەکە لەوە مەترسیدارتر بوو، ئەوان بریاریان دا بە ئاشکرا باس لە خراپی حوکمی عوسمانی بکەن و لە دانیشتنی ئەنجوومەنی گشتیدا تورکیایان رەتکردەوە و سوور بوونی خۆیان راگەیاند لەسەر ئەوەی جارێکی تر ملکەچی ئەو کەسانە نابن کە زوڵمیان دەکرد"[٥٧].

ئادمۆنس لە لێکۆڵینەوەکانیدا بەم شێوەیە هەڵسەنگاندنی بۆ هەڵوێستی شێخ مەحمود کردووە لە لێکۆڵینەوەکانیدا:

"شێخ مەحمود ژیرتر و دووربین ترە لەوەی لەکاتی سەردانی لیژنەکە خۆی دەربخات، بۆیە خۆی دوور گرت، ئەوانەش بەخۆرسك بریاریان دا کە کارێکی جوان نییە خۆیان بخەنە پێش شۆرشگێرێکی ئاشکرا تاکو شایەدی پێشکەش بکات، بەم شێوەیە شێخ چاوەرێی کرد تاکو گەرانەوە و بەردەوام بوو لە تەکتیکە جەنگییەکانی" [٥٨].

پێویستیشە ئاماژە بۆ شێخ مەحمود بکەین کە ئەم هەڵوێستەی گرتە بەر، لەکاتێکدا کە کێشەی موسڵ برگەکانی پەیماننامەی سیڤەریان دەخستە روو بۆ کێشەی نەتەوەی کورد، کۆنگرەی سەندیکای کرێکاران و لیژنەی راوێژکاری لەکاروباری نێودەوڵەتی پارتی کرێکارانی بەریتانی ئەوەیان بیرهێنایەوە کە "بەریتانیا رەزامەندی دەربریوە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی لە پەیماننامەی سیڤەردا"[٥٩]، هەر وەك لیژنەی (عصبە الأمم) خۆی نەیتوانی برگەکانی پەیماننامەی سیڤەر فەرامۆش بکات، ئەمەش رەهەندێکی تایبەتی بۆ هێزەکانی نەتەوەی کورد خستە روو لە بارەی کێشەی موسڵ، لەگەڵ ئەوەشدا بانگەشەی تورکیا گەورە و کاریگەر بوو لەسەرەتای وروژاندنی کێشەکە[٦٠]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بێدەسەڵاتیش بوو لەوەی کاریگەری بخاتە سەر رای گشتی کورد تەنیا لەسەر دیاریکردنی سنوور نەبێت.

بـەم شـێـوەیـە کـورد بـە کـوردەکـانـی کـەرکـوك و دەوروبـەریـشـیـەوە، رۆڵـێـکـی کاریگـەریـان لـە هەموو رووەکانەوە بینی لەپێناو ئەوەی ویلایەتی موسڵ بخرێتە سەر عێراق، ئـەوەش بەهۆی چەند هاندانێکی جیاوازەوە کە بەهیچ شێوەیك لە بەرژەوەندیشیاندا نەبوو، بەڵام بەپێی پێویست رێزی لێ نەگیرا، ئەدمۆنس کە یەکێك بوو لەزیاترین ئەو کەسانەی کە ئاگاداری وردەکاری ئەو هەڵویستانە بوو بۆ یەکلاییکردنەوەی چارەنووسی موسڵ دەڵێت:

"سەردانی کردنی لیژنەکە هەستێکی نیشتمانی توندی بە کورد بەخشی، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی لایەنێکی زۆر تووشی نیگەرانی بن، چونکە پێشبینی ئەوەیان دەکرد کە کورد لەگەڵ تورکیادا بووەستێت، کەواتە بەم هەڵوێستە دەبێت کورد لە سەربازگەی بەرانبەری تورکدا بن، هەموو لێکۆڵینەوەکان لەوەدا بوون کە هەمووی وەکو یەك ببنە ئاراستەیەکی نەتەوەیی، بەڵام هیچیان مۆرکی جوودایی بەشێوەیەکی گشتی وەرنەگرت، کوردانی سلێمانی دەکرێت بوترێت گورزێکی کوشندەیان لە شەری پارێزگاری کردن لە کیانی عێراق دا، بە تەواوەتی درکیان بەوە شتە کرد کە کردوویانە، بەڵام ئاخۆ حکوومەتی عێراق بۆ ئەو ئاستە بەرزدەبێتەوە کە رۆنانی سیاسەتێکی باش بکات و دوور بین بێت بەرانبەر بە کورد؟ راپۆرتی تایبەتی لیژنەکە کە (عصبە الأمم) ئێستا هاتووە پشتیوانی لە خواستی ئەو کوردانە دەکات کە وڵاتەکەیان لە دابەشبوون رزگارکرد بەو هەڵوێستە مێژوییە لە سلێمانی، سەرکردەکانی رای گشتی کورد بەردەوام بوون لەسەر ئەو هەڵوێستە باڵایە لەگەڵ خودی خۆیان و لەگەڵ ئەو دەوڵەتەی کە تێدا سەلماندیان کە ئەوان تەنیا هاووڵاتیگەلێکی زەلیل نین"[٦١].

کاتێك هەڵسەنگاندن بۆ هەڵوێستی کورد دەکەین لە ململانێی مێژووەکەی لەپێناو موسڵدا، پێویستە هەڵوێستی هێزی نەتەوە عەرەبییەکانی عێراق بهێنینەوە بەرانبەر بە ماڤ رەوای کورد، کە مۆرکی شۆڤێنیانەی لەخۆگرتبوو، تەنانەت لەو دۆخە قورسەشدا بەشێوەیەکی سەخت کوردیان فەرامۆش کرد، هیچ کام لەو حیزب و کۆمەڵە و دەستانەی کە لەو رۆژانەدا بۆ بەرگری کردن لە عێراق لە ویلایەتی موسڵ دەرکەوتن، لە بەرنامەکانیاندا یاخود رۆژنامە و

چالاکییەکانیاندا بەهیچ شێوەیەك ئاماژەیان بۆ مافی کورد و کێشەکەیان نەکرد، هەرچەندە بە بەردەوامی دانی بەوەدا دەنا کە کورد زۆرینەی دانیشتووانی ویلایەتەکەیە[٦٢].

تەنانەت لەسەر مەسەلەی زۆرینەی کوردیش، هیچ لایەنێك هەڵوێستێکی بابەتیان وەرنەگرت. سەرەرای ئەو حەماسەتەی کە بۆ یاداشتنامەکەی (کۆمەڵەی کوردی) دەریان بری، وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆی کرد، کەچی ژمارە و ئامارەکانیشیان رەتکردەوە کە لە یادشتنامەکەدا هاتووە، لەکاتێکدا کۆمەڵەکە زانیاری لە ساڵنامەی عوسمانی وەرگرتبوو، ئەو ژمارەیەی کە لەسەر کورد بڵاوکرایەوە بریتی بوو لە ٤٥٠ هەزار، کەمتریش بوو لەو ژمارەیەی کە لە تۆمار و ئامارەکانی باری کەسێتی عێراقی لە ساڵی ١٩٢٢ و ١٩٢٤ خرایە روو کە بریتی بوو لە ٤٩٤٠٠٧ کەس، لەکاتێکدا ژمارەی عەرەب تەنیا ١٨٠ هەزار کەس بوو و زیاتر بوو لە ئامارەکە کە بریتی بوو لە (١٦٦٩٤١) کەس، پێویستیشە ئاماژە بۆ لیژنەی (عصبة الأمم) بکەین کە پێی وابوو ژمارەی ئاماری باری کەسێتی عێراق لە ساڵی ١٩٢٢-١٩٢٤ بە رێکترین ئامار لە قەڵەم دا و لەهەموو ئامارەکانی دیکەی بە باشتر زانی کە لەلایەن لایەنە ناکۆکەکانەوە پێشکەشی کرا یاخود لە سەرچاوە جیاوازەکان خرابووە روو، هاوکات (حزب الأمة) کاتێك یاداشتی (کۆمەڵەی کوردی) بڵاوکردەوە لەراپۆرتەکەیدا لەسەر دۆسێی موسڵ، دێرێکی لەسەر نووسیبوو (ئەم ئامارە حزب الأمة دانی پێدا نانێت)، ئەوەش لەدوای ئەو زانیاریانەی کە کۆمەڵەکە لە یاداشتنامەکەیدا بڵاویکردەوە.[٦٣].

رۆژنامەی (الاستقلال) هەمان رێچکەی (حزب الأمة)ی گرتە بەر[٦٤] بەڵکو لەوەش زیاتری کرد بەو هەڵوێستە شۆڤێنییە کە بڕوای پێناکرێت، بەهۆی شەرمەزاریی هەڵوێستەکەی لەو کاتەدا، هەروەها بۆ پێویستی راکێشانی سۆزی کورد و زامن کردنی پشتیوانییان، بەڵکو بەشێوەیەکی زۆر ناشرین و بە شێوازێکی زۆر دوور لە سادەترین بنەماکانی بابەتی یاخود زەوقی بەلانی کەمەوە، لە ژمارەی ٦٠٤دا نووسی:

"خەڵکی کوردستان گەل نین، بەڵکو کۆمەڵێك هۆزن و زمانیان یەك نییە، هەر هۆزێکیش بە زمانێکی جیاواز قسە دەکات".

(استقلال) لەو تاڵ و ناخۆشتریشی وت، بە زمانی (تۆرانییەکان) و ناوچەکانیان قسەی کرد، لە هەمووی سەیرتر کە هەر کەسێك بییەوێت تێبگات، شیکردنەوەیەکی لۆژیکی دەست ناکەوێت تەنانەت ئەگەر بە شۆڤێنیانەش بیر بکاتەوە، هاوشێوەی توونڕەوەکان. (استقلال) پرسی "ئایە راستە کوردستان نەتەوەی کوردی راستەقینەن؟" وەڵامی دایەوە "ناتوانین وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە بەشێوەیەك کە نزیك بین لە راستییەوە، دەشتوانین بڵێین دانیشتووانی ئەستانە کوردی راستەقینەن، کە بوونە بە تورك و رەگەزی راستەقینەی خۆیان لە بیرکردووە، زۆرێکیش لە شێخەکان کە تورەیی ئاینیان بەسەر تورەیی نەتەوەییاندا زاڵ بووە، تەنیا خۆیان بە تورك دەناسێنن"[٦٥].

رەهەندی ئەم وێنە تەمومژاوییە روون دەبێتەوە کاتێك کە بزانین، ئەندامانی ئەنجوومەنی دامەزراندن کاریان بەو یاداشتە نەکرد کە نوێنەرانی کەرکوك و هەولێر پێشکەشی ئەنجوومەنیان کرد، لەکاتی گفتوگۆکان لەسەر کێشەی موسڵ، کە پێشتریش ئاماژەی بۆ کرا، بەشێوەیەك محەمەد شەریف کە یەکێك بوو لەو کەسانەی کە واژۆیان لەسەر یاداشتەکەکردبوو، ناچار بوو روونکردنەوەیەك پێشکەش بکات کە ئەمە دەقەکەیەتی و هەڵوێستێکی بەرز و روونی تێدا دەردەکەوێت:

"زۆر بە راشکاوی ئێمەی خەڵکی باکوور، مەبەستم کوردەکانە، نامانەوێت بەهیچ شێوەیەك لە عێراق جیا ببینەوە، چونکە هەرگیز کورد بە بێ عێراق ناژێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سازش لەسەر داواکاری مافی کەمینەکان ناکەین لە رووی تایبەتمەندێتی ئیدارییەوە و بەپێی ئەوەی لەمادەی ٣ی پەیماننامەی (عێراقی - بەریتانی) هاتووە[٦٦]. ئەم هەڵوێستە نیگەرانانییەش وامان لێدەکات راپۆرتێك بۆ سەرۆکی بەرێز بەرزبکەینەوە و تێدا هەڵوێستی خۆمان بەرانبەر بە پەیماننامەکە دەربخەین لەگەڵ نیشاندانی هۆکارەکانی، بۆیە تکامان وایە لە هاورێ بەرێزەکانمان ترس نەکەنە نێو نیشتیمانپەروەریمانەوە و بەهیوایین راپۆرتەکەمان نەبێتە هۆی دروستکردنی دۆخێك کە پێچەوانەی نیازپاکیمان بێت و بەو پێیەی ئێمە لەم راپۆرتەدا لە سنووری یاسایی دەرنەچووینە"[٦٧].

سەرەرای ئەوەش نوێنەری هەولێر، داود ئەلحەیدەری ناچار بوو یاداشتەکە بکشێنێتەوە بە ناوی ئەو کەسانەی کە واژۆیان لەسەر کردووە، هەرچەندە لە بنەرەتدا داوای دواخستنی بریاردان لەسەر پەیماننامەی (عێراقی - بەریتانی) دەکرد، تا ئەو کاتەی چارەنووسی موسڵ یەکلایی دەبێتەوە، ئەوەش ئەو دروشمە بوو کە سەرجەم هێزە نیشتمانییەکان بەرزیان کردەوە، بەڵام جێگەی قبوڵ نەبوو لەلایەن کوردەوە، چونکە ئەوان داواکارییەکی سادەیان بۆ بەشێکی بچووکی مافی رەوای خۆیان وابەستە کرد[٦٨].

ماوەیەکی زۆر کەم تێپەری لەسەر ئەو رووداوانەی نێو ئەنجوومەنی دامەزراندن تا سەردەمی پێکهێنانی وەزارەتی نوێ بۆ یاسین ئەلهاشمی لە دووی ئابی ساڵی ١٩٢٤، تاکو هاوکات بێت لەگەڵ کاتی حوکمەکەی لە ٢١ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٥، گرنگترین و ووردترین قۆناغەکانی کێشەی موسڵ، ئەوەی پێویست بوو بەبێ گومان کردن تەبەناکردنی سیاسەتێکی نەرم بەرانبەر بە کورد بەلانی کەمەوە بە دیدێکی تەکنیکی تەواو، وەزارەت لە میتۆدەکەیدا کە لە رادیۆ بڵاویکردەوە لە رۆژی هەشتی ئابی ساڵی ١٩٢٤، بەڵێنی دا کە بەشێوەیەکی تایبەت "رێوشوێنی گونجاو دەگرێتە بەر بۆ خۆشگوزەرانی دانیشتووانی ناوچەی سلێمانی و کار بۆ کەمکردنەوەی کێشەکانیان دەکات بەو پێیەی رووبەرووی ئازارێکی زۆر بوونەتەوە"، سەرجەم رۆژنامەکانی پایتەخت دەقی ئەم بەڵێنە راشکاوەیان بڵاو کردەوە، بە رۆژنامەی ئیستقلالیشەوە[٦٩].

لێرەوە قسەکردن لەسەر رووداوەکان بۆ عەبدولحافز

ئەلقەیسی پسپۆڕی یەکەمی مێژووی ژیانی یاسین ئەلهاشمی بەجێدێڵین، هەروەها ڕۆڵیشی لەسەر سیاسەتی عێراق، کە لەمبارەیەوە خستویەتییە ڕوو لە "توێژینەوەیەکی دۆکیۆمینتاری و پلەی (ماجستێر)ی بە پلەی نایاب لەسەر مێژووی عێراقی نوێ لە زانکۆی بەغدا وەرگرت":

"کاتێك یاسین ئەلهاشمی دەسەڵاتی لە ٢٤ی ئابدا گرتە دەست لە ساڵی ١٩٢٤، دۆخی کوردستان زۆر مەترسیداربوو، هەستیکرد کە نیگەرانییەکی گشتی لەلای ڕای گشتی جیهانی عەرەبی هەیە بەهۆی تێکچوونی بارودۆخی باکووری عێراق و ڕۆژنامەکان لەچەند ڕوویەکەوە خستیانە ڕوو، بەڵام هەموو لایەن هاوڕا بوون لەسەر ئەوەی پێویستە سنوورێك بۆ ئەو دۆخە دابنرێت، یاسین هاشمی ویستی سوود لە ویستی ڕای گشتی وەربگرێت، بۆیە لە بەرنامەی گشتییدا خستییە ڕوو بۆ ئەوەی پێگەی وەزارەتەکەی لەنێوەندە میللییەکاندا پتەوتر بکاتەوە، بەشێوەیەك بەڵێنیدا بە گەل، کە دوای شەش ڕۆژ لەبەدەستهێنانی کورسی وەزارەت، ڕێوشوێنی پێویست دەگرێتە بەر بۆ خۆشگوزەرانی دانیشتووانی ناوچەی سلێمانی و هەروەها ئازار و کێشەکانیشیان کەمدەکاتەوە.

بەڵام ئەو بەوەفا نەبوو بۆ بەڵێنەکەی و لەسەر ڕێچکەی وەزارەتەکەی پێشووی بەردەوام بوو بە بەکارهێنانی توندوتیژی و سەرکوتکاری بۆ ئەم کێشەیە، پێدەچێت یەکێکیش بوبێت لە توندوتیژترین ئەو کەسانەی کە کاری لەسەر ئەم بابەتە کردبێت، چونکە سەرۆك وەزیر و وەزیری بەرگری بوو، ، وەزارەتەکەشی لەماوەی نێوان ٢٠ بۆ ٣٠ ئابی ساڵی ١٩٢٤ زنجیرەیەکی بەردەوامی هەڵمەتی سەربازی لەدژی هێزەکانی شۆڕشی کوردی ئەنجامدا و پرۆسەی ئاسمانیشی بەدوای خۆیەوە هێنا لەلایەن هێزی ئاسمانی بەریتانیا، لە ماوەی نیوەی مانگی ئەیلولی ١٩٢٤دا ڕوویدا[٧٠].

ئەم بەدواداچوونە هاوکاریمان دەکات لەوەی نەچینە نێو وردەکاری بابەتەکەوە، بەڵام جێی ئاماژەیە کە باس لە یاسین ئەلهاشمی خۆی بکەین، یاسین هاشمی بەرەگەز عەرەب نەبوو، سەرەرای ئیدیعای خانەوادەکەی[٧١]. وەزارەتەکەشی کەسێکی ڕۆشنبیری لەخۆگرتبوو، دڵسۆزێکی پلە یەك بوو کە ئەو محەمەد ڕەزا ئەلشبیبی بوو، بەوە ناسرابوو کە مەیلی دیموکراتییەت و لۆژیکی نیشتیمانی هەبوو، بوێرییەکی دەگمەنیشی هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەماوەی بوونیدا لە وەزارەتەکەی هاشمی[٧٢] بێ دەنگ بوو، بێدەنگییەکەی هاوشێوەی بێدەنگی نێو گۆڕەکان بوو لەبارەی ڕووداوەکانی سەر کورد، لەکاتێکدا بەهۆی بەخشینی وەزارەتی یەکەمی نەوت بە کۆمپانیا بیانییەکان دەستی لەکارکێشایەوە، ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر دڵسۆزی و بوێری و قوربانی دانی، چونکە کاتێك دەستی لەکارکێشایەوە لەدۆخێکی دارایی قورسدا بوو.

ئەم هەڵوێستانە بەر هەستی کوردەکان کەوت، تەنانەت مەعروف جیاوك کە کەمێك بەر لە ئێستا وتمان توندترین ئەو کەسانە بوون کە پشتیوانیان لە ئیسلام و برایەتی عەرەب و کورد دەکرد و بەرگری لە عێراق دەکرد لەئاست کێشەی موسڵدا و زنجیرییەك وتاریشی نووسی لە ڕۆژنامەی (المفید)ی بەغدادی ئەوەی تێدا هاتووە "سوود بە وڵات دەگەیەنێت و پەیوەندی نێوان کۆمەڵگە و تایەفە و تاکەکانی پتەو دەکاتەوە، بریاریدا "دەستبەرداری سیاسەت ببێت و دەست بە نووسین بکات بۆ ماوەیەك کە زمانی توندرەوەکانی عەرەب توندتر بوو بەرانبەر بەلایەنەکانی تر، بە تایبەتیش لایەنی کورد" (موفید)یش لەسەر ئەوە توانجێکی دا و وتی:

"ئێمە بۆ چیاوکی[٧٣] و هەموو باشەکانی نەتەوەکەی دووپاتیدەکەینەوە بەوەی میلەتی عەرەب ئەوەی لەبەرچاوە کە چۆن تورکیا بەهۆی ستەمکردن لە نەتەوەکانی تر ترازا، هەرگیز ئەوکارانەیان لە بیر ناکرێت، ئەمە جگە لە ئارامگرتن و ئەو وانە سەختانەی کە لە ژێر دەستی تورکیا بینییان، ئێمە هەرگیز ناوی ئەو لایەنانە بە توندرەو نازانین کە بەرهەڵستی تورکیا بوون، بەڵکو ئامۆژگاریان دەکەین کە خیانەت بکەن و لە یەکککرتوویی دەربچن، مەحاڵیشە ئەوانە عەرەبن، بەڵکو ئەوان دووژمنی عەرەبن، دەیانەوێت بە بۆگەنەکانیانەوە ئەم خاکە داگیر بکەنەوە[٧٤] . بەڵام بەداخەوە کەمن ئەوانەی بەم لۆژیکە ڕێکوراستە بیر دەکەنەوە، بەتایبەتی لە ڕیزی عەرەبە نەتەوەییەکانی عێراقی ئەو کاتە، ئەوانەش هێندە کەم و دەگمەنن وەکو کەمی و دەگمەنی ئاو لە بیابان.

ئـەو لـیـژنـەیـەی کـە (عصبـة الأمـم) پێـکـیـهـێـنـا بۆ چارەسـەرکـردنـی کێـشـەی مـوسـڵ، کـۆتـایـی بـە ڕاپـۆرتـە مێژووییەکەی هێنا لە ناوەراستی تەموزی ساڵی ١٩٢٥ و پێشکەشی ئەنجوومەنی (عصبە)ی کرد، هـەروەك بەسەر ڕۆژنـامـەگـەری جیهانیشدا دابەشیکرد، لیژنەکە لـەدوای لێکۆڵینەوە کـردن لـە کێشەکە لـە هـەمـوو ڕووەکـانـیـیـەوە لەراپۆرتەکەیدا جەختدەکاتەوە کە بیانوە بنەرەتییەکان و بە تایبەتی بیانوە ئابووری و جوگرافی و سۆزی زۆربەی دانیشتووانی کە جەخت دەکـەنـەوە بۆ ئـەوەی ویلایەتەکە بخرێتە سەر عێراق، بەڵام بە دوو مەرج یەکەمیان ئەم خاکە لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیدا بمێنێتەوە تاکو ٢٥ ساڵ بۆ زامن کردنی جێگیربوونی ناوچەکە و دووەمیش ڕەچاوکردنی ویستی کوردەکان[٧٥].

ئەنجوومەنی عصبە بریاری خۆی دا بۆ ئەوەی ویلایەتی موسڵ بخرێتە سەر عێراق لە شانزەی کانوونی یەکەمی هەمان ساڵ، ئەوەش بوو بە یاداشتێکی نێودەوڵەتی نوێ کە دەبێت پابەند بن بە مافی نەتەوەی کورد لە عێراق، لەگەڵ کوردەکانی کەرکوك و دەورووبەریشی.

هەردوو حکوومەتی بەریتانیا و عێراق بە فەرمی پابەندبوونی خۆیان بە دوو مەرجەکە ڕاگەیاند[٧٦]. سەبارەت بەمەرجی تایبەت بە مافی کورد دەسەڵاتدارانی بەریتانیا بە هەماهەنگی لەگەڵ دەسەڵاتی لۆکاڵی یاداشتێکیان ئامادەکرد کە چەند ڕاستییەکی دیاریکرا و لەسەر ئیدارەدانی ناوچە کوردییەکان لەخۆ گرتبوو و دەقی وتاری سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران لەبەردەم ئەنجوومەنی نوێنەران لە بیستویەکی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٦، تێدا جەختکرایەوە لەسەر ئەوەی دەبێت مافە نەتەوەیەکانی کورد بدرێت و یاداشتێکیشی لەگەڵ دانرا کە پێشکەش بە عصبە

کرابوو بەمەبەستی درێژکردنەوەی پەیماننامەی (عێراق – بەریتانیا)، لەسەر ئەو چوارچێوەیە ئەنجوومەنی عصبە لە ١١ ئاداری ساڵی ١٩٢٦ ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر پرۆژە بڕیارێکی نوێ، تێیدا ڕایگەیاند "بڕیاری ڕۆژی ١٦ی کانوونی یەکەم ساڵی ١٩٢٥ بڕیاری کۆتاییە"، ئەنجوومەن لەهەمان کاتدا یاداشتەکەی بەریتانیای کە تایبەت بوو بە ئیدارەدانی ناوچە کوردییەکان ڕەوانەی لیژنەی دەسەڵاتی بەریتانیای سەر بە چاودێرکردن و جێبەجێکردی پەیماننامەی سەر بە پاراستنی ماف نەتەوەی کورد لە عێراق کرد، بابەتەکە بوو بە کۆڵەکەیەکی بنەڕەتی لە ڕاپۆرتەکانی داهاتووی حکوومەتی بەریتانیا کە پێشکەشی (عصبە الأمم)ی دەکرد لەبارەی بەڕێوەچوونی ئیدارە لە عێراق، کەرکوکیش بەهەمان شێوە بۆ خۆی شوێنی پێشووی خۆی گرت لەو گۆشە تایبەتەی کە لە دۆسیێ کوردا هەیە[٧٧].

ڕوونمکردەوە کە "سۆزی زۆری دانیشتووان"ی ویلایەتی موسڵ کە یەکێکە لە کاریگەریترین ئەو کارلێکەرییە یەکلاییکەرانەی کە چارەنووسی موسڵی یەکلایی کردەوە بۆ بەرژەوەندی عێراق، لە توێژینەوەکەشدا کۆمەڵێك ڕاستیمان خستە ڕوو کە بە پلەی یەکەم لەسەر کوردی ویلایەتەکە جێبەجێ دەکرێت، لەگەڵ کوردەکانی کەرکوك و دەوروبەری، ئێمە لەبەر ئەوەی ئەم ڕاستییە لە چوارچێوەیەکی واقعیدا دەربکەوێت، چەند شتێکی دیکە دەخەینە ڕوو، ئەویش ئەوەیە کە لیژنەی عصبە "شۆك بوو کە بینی ژمارەی ئەو عەرەبانەی کە پاڵپشتی تورکیا دەکەن لە ویلایەتی موسڵ چەندە زۆرە، لەنێوان ١٨٨ شایەددا ٥٣یان پشتیوانی تورکیان کرد و ١٠٢یان پشتیوانی عێراقیان کرد.

بڕیار بوو ئەم هەڵوێستە ببێتە هاندەرێکی بەهێز و جێگیر بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە عێراق لەسەر بنەمای دیموکراتی بە ئاراستەیەك کە "کاریگەری لەسەر کوردەکانی تریش بکات"، لەوەش زیاتر کار بۆ "زامنکردنی بەدیهێنانی ئاشتی لەم بەشەی جیهان" وەکو یەکێك لە ئەندامانی ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیا هیوای بۆ خواست[٧٨]، بەڵام ئەوە ڕووینەدا بەداخەوە، ئەو کارەش ئێستا تێبینی دەکەین لەڕێگەی چەند لایەنێکییەوە، کە کاتێك باس لە پێشهاتە سیاسییەکان دەکەین لە ناوچە کوردییەکان لەدوای چارەسەرکردنی کێشەی موسڵ و لەچوارچێوەی پەیوەندیی بە مشتومڕکردن لەسەر کەرکوك و دەوروبەری.

****

* پەراوێزەکان:

1-the parliamentary dabates. The house of commons. official report. fifth series. vol.189. 1934-1925. London. col.2102.

2-A.J. Toynbee. angora and the british Empire in the Esat. the contemporary review London. vol CXXIII. june 1923. PP.686-687.

3-the time. no.44. 150. December 21. 1925.

٤-نعود الى تفصيلات ذلك في المبحث "كروكو و توابعها في الاحصاءات الرسمية وغيرها"

5-"british office، turkry No1 (1923)، Lausanne conference on Near Eastern affairs 1922-1923، record of proceeding and draft terms of peace Cmd. 1814 "، p.373.

6-Ibid، p.366.

7-Ibid، p359

8-'the contemporary review "، vol. CXXLLL، june 1928، pp.386-387.

9-الدكتور فاضل حسين، مشكلة الموصل، الطبعة الازلى، ص٢٨.

10-league of nations.Question of the frontier between turkey and Iraq by the commission instituted by the council resolution of September 30، 1924 "، Lausanne، 1925، p.16.

11-C.J.Edmonds، kurds، turks and arab، pp.420، 422. في الترجمة العربية ص ٣٧٤، ٣٧٦.

١٢-مجلة المجمع العلمي العراقي. الهيئة الكردية، المجلد الثاني عشر، ١٩٥٨ ص ٤٢٠-٤٢٢

13- public record office، air، 23-190، part II، XM-4583، summary of Intelligence Service officer sulaimani for the period ending 21st February 1925، Secret.

١٤- عن ذلك ينظر في: الدكتور فاضل حسين، مشكلة موصل، الطبعة الأولى، س ٣٧٤، ٣٧٦

15- public record office، air، 23-190، part II، XM-4583، aviation، Baghdad، 23-2، Y-3335، secret.

16- C.J.Edmonds، kurds، Turks and arabs، p.416. في الترجمة العربية: ص٣١٧

17- "the near east and India"، vol، XXVIII، No.745، august20، 1925، pp.217-218.

18- "league of Nations. Question of the frontier between turkey and Iraq.." pp.54-55

19- Ibid، pp، 8687.

20-Ibid، pp.5777، 89. من الجدير بالذكر ان الدكتور فاضل حسين ثبت معظم هذه الحقائق نصا و مضمونا في اطروحته باللغة الانكليزية و في الطبعة الأولى من كتابة المطبوع في بغداد في العهد الملكي، فيما حذف الرقيب مقاطع مهمة من الكتاب في طبعاته اللاحقة.

21-Ibid، pp، 88-89

٢٢-"الحكومة العراقية. وزارة الداخلية مجموعة مذكرات المجلس التاسيسي العراقي لسنة ١٩٢٤ بغداد، بلا ص٣٥٢.

٢٣-المصدر نفسه ص ٣٤٤

٢٤-علي جودت الايوبي (١٨٨٦ . ١٩٦٩) من مواليد مدينة الموصل، خريج المدرسة(كلية) العسكرية بأسطنبول سنة ١٩٠٦، عروبي النزعة، شارك في الثورة العربية بقيادة الشريف حسين، شارك في حكومة الملك الفيصل في سوريا، مثل الموصل في البرلمان العراقي مراراً، منذ عام ١٩٣٠ شارك في تاليف عدد من اهم الوزارات، رئيس للديوان الملكي ١٩٣٣، رئيس وزراء اكثر من مرة، سفير للعراق في فرنسا والولايات المتحدة الامريكيية و غيرهما.

٢٥-"مجموعة مذكرات المجلس التأسيس العراقي..." ص٣٩٣.

٢٦-المصدر نفسه ص ٣٤٢ . ٣٤٤

٢٧-يستثنى من ذلك موقف عدد قليل من اعضاء المجلس من امثال حبيب خيزران ممثل ديالى، و عمر الحاج علوان ممثل كربلاء، و داود الجلبي ممثل الموصل.

٢٨-"مجموعة مذكرات المجلس التأسيس العراقي..." ص ٥١٧-٥١٨

٢٩-المصدر نفسه ص ٥١٨ - ٥١٩

٣٠-المصدر نفسه ص ٥١٧

٣١-يقصد اول معاهدة عقدت بين العراق و بريطانيا في العام ١٩٢٢، و التي ارتبط موضوع التصديق عليها و ابرامها بمشكلة الموصل، و بافرازات القضية الكوردية بصورة مباشرة.

٣٢-من ابرز شعراء الكورد المجددين، ولدبكويسنجق و توفي باسطانبول سنة ١٨٩٧، عرف بروحه القومية الجياشة و بعنايته الفائقة بقومه، يشبهه الباحثون بالشاعر التركي معروف نامق كامل.

٣٣-مجموعة مكرات المجلس التأسيس العراقي.. ص٥١٩

٣٤-حسين الجميل، العراق، شهادة سياسيية ١٩٠٨ . ١٩٣٠، دار اللام، لندن، ١٩٨٧، ص ١٤٢.١٤٣.

٣٥-عن ذلك يروي لنا ادمونس، وهو شاعر عيان مهم، امثلة معبرة، ينظر: C.JEdmond، kurdesh، turks and arabs، pp.282، 409، 416-417، 420.

٣٦-الدكتور فاضل حسين، مشكلة الموصل الطبعة الأولى، ص١٢٠.

٣٧- الاستقلال، جريدة، بغداد، العدد ٥٥٦، ٨شباط١٩٢٥

٣٨-العالم العربي، ١٤ آذار ١٩٢٥

٣٩-الدكتور فاضل حسين، مشكلة الموصل الطبعة الأولى، ص ٢٢٩ . ٢٣٠

٤٠- "تقرير حزب الأمة عن قضية الموصل"، مطبعة دار السلام، بغداد، ١٩٢٥، الملحق رقم ١، ص ا. هـ.

٤١-المصدر نفسه ص ٢٣.

٤٢-مقابلة مع المحامي يوسف الحاج الياس بتاريس ١٥ ايار ١٩٩٥.

٤٣-العالم العربي ٢٥و٢٦ تشرين الاول و ٤ تشرين الثاني ١٩٢٤ و غيرها: الاستقلال، ٢٦ تشريت الاول، ١٩٢٤ و ١٩ و ٢٧ شباط، و ٣ و ٩ و ٢٤ آذار ١٩٢٥ و غيرها.

٤٤- ننظر على سبيل المثال البرقية المطولة من "رواندوز مركز الامارة الكوردية" في العددين ٥٧٣ و ٥١٨ من جريدة الاستقلال لصاحبها عبدالغفور البدري، الصادرين في ٢٧ شباط و ١٩ آذار ١٩٢٥.

٤٥-عبدالرزاق الحسني، تأريخ الصحافة العراقية، ص٨٦

٤٦-جياوك الكردي، القضية الكردية، بغداد، ١٩٢٥، ص ٢٦ . ٦٦

٤٧- مقتبس من العالم العربي العدد ١٩٤، تشرين الثاني ١٩٢٤، ص ٢

٤٨- للتفصيل عن الانتفاضة ينظر الى: كمال مظهر، انتفاضة عام ١٩٢٥ الكردية في تركيا، دراسة تحليلية، الطبعة الثانية، كاوا للنشر و التوزيع، بيروت، ٢٠٠١.

٤٩- نظر على سبيل المثال:

"the time "، February 28، march 5، april، 7، 9، 13، 16، 28، may 29، august 25، November 26.1925; "survey of international affairs 1925"، Vol، Ipp.508-510' the near east and india "august 13، 17، 1925.

٥٠- مقتبس في: الدكتور فاضل حسين مشكلة الموصل، الطبعة الأولى، ص ١٥٥.

٥١-المصدر نفسه ص ٣١٣.

٥٢-إعداد "العالم العربي" و الاستقلال" و "العراق" و "المفيد" و غيرها طافحة بالاخبار و التعليقات و المقالات عن انتفاضة عام ١٩٢٥ في كردستان تركيا.

٥٣- سنظر في سبيل المثال في "العراق"، ١١ آب ١٩٢٥.

٥٤- عن ذلك ينظر في الدكتور فاضل حسين مشكلة الموصل، الطبعة الأولى، ص ٢٩٦.

55- "2000 dogru dergisi "، sayi 46، 6.XI.1988;

الدكتور ابراهيم الداقوقي، اكراد الدولة العثمانيية "المجلة التأريخية العربية للدراسات العثمانيية"، تونس العدد الخامس و السادس، فيفري ١٩٩٢، ص ١٩٤.

56- C.J Edmonds، kurds، turks and arabs، p.413. في الترجمة العربية:ص ٣٦٩

57- Ibid، p، 422.

في الترجمة العربية: ص ٣٧٦

٥٨-مقتبس في: الدكتور فاضل حسين، مشكلة الموصل، الطبعة الأولى ص ٢٤٦ . ٢٤٧

59- "the near east and India"، Vol، XXII،

No.604، December 7، 1922، p.723.

60- C.J Edmonds، kurs، turks and arab، p.434.في الترجمة العربية: ص ٣٨٦.

٦١-عن المناهج و نشاطاتها سنظر في: عبدالرزاق الحسني، تأريخ الأحزاب السياسية العراقية، ص ٧٠ . ٨٦، الدكتور فاروق صالح العمر، الأحزاب السياسية في العراق ١٩٢١ . ١٩٣٢، بغداد ١٩٧٨، ص ١٣٤ . ١٣٥، ١٤١ . ١٥٥؛ "تقرير حزب الأمة عن قضية الموصل".

٦٢- تقرير حزب الأمة عن قضية الموصل"، ملحق الرقم ١، ص:ب

٦٣- الاستقلال العدد ٥٦٦، ٨ شباط ١٩٢٥، ص ٣

-٦٤المصدر نفسه: جياوك الكردي، القضية الكردية، ص ٦٧ . ٨٢.

٦٥-يقول نص المادة الثالثة من المعاهدة بهذا الخصوص "يوافق جلالة الملك العراق على ان ينظم قانونا اساسيا ليعرض على مجلس التاسيسي العراقي، و يكفل تنفيذ هذا القانون الذي يجب ان... ياخذ بعين الاعتبار حقوق ورغائب ومصالح جمع السكان القاطنين في العراق، ويكفل للجميع حرية الوجدان التامة...".

٦٦-مجموعة مذكرات المجلس التاسيس العراقي ص ٣٤٣ . ٣٤٤

٦٧- المصدر نفسه ص ٣٤٢ . ٣٤٤، ٣٤٥، ٤٢٥، ٤٣٠، ٤٣٣. ٤٣٤.

٦٨- الاستقلال العدد ٤١٧ ٨ آب ١٩٢٤

٦٩- سامي عبدالحافظ القيسي، ياسين الهاشمي و دوره في السياية العراقية بين عامي ١٩٢٢. ١٩٣١، البصرة، ص٢٧٧. ٢٧٩.

٧٠- للتفصيل عن ذلك ينظر في: المصدر نفسه، ص ٢١ . ٢٣، العراق في وثائق بريطانية سنة ١٩٣٦، ص ٧٨. ٧٩، مقابلة مع محمد جميل روزبياني بتاريخ ١٤ تموز ١٩٩٤، مقابلة مع اللواء المتقاعد فؤاد عارف بتاريخ ٢٢ تموز ١٩٩٤.

٧١- اشرف مؤلف هذا الدراسة على رسالة ماجستير و اطروحة دكتوراه عن محمد رضا الشبيبي اعدهما الدكتور علي عبد شناوة، وقد طبعت الأولى في لندن سنة ١٩٩٥ و الثانيية في بغداد سنة ٢٠٠٣.

٧٢- في النص: له

٧٣- المفيد العدد ١٦٥ ٨آب: جياوك الكردي، القضية الكوردية، ص ٢٦. ٣٠

74- league of Nations. Question of the frontier between turkey and Iraq، pp.88-89

75- survey of Interntional affairs، 1925، pp520-521

76- league of Nations. Frontier between turkey and Iraq treaty between great Britain and Iraq signed at Baghdad on January 13th 1926"، genva 1926.

٧٧-ينظر على سبيل المثال موضوع الاكراد في:

"Special report by his majesty، s government .. to the council of the league of nations on the progress of Iraq during the period 1920-1931 pp.251-266.

٧٨-الدكتور فاضل حسين، مشكلة موصل الطبعة الأولى ص ١٢٢.

"the parliamentary debates. The house of commons"، official report، fifth seres، Vol.189، 1924-1925، col.2102

*** نائارامیی لە هەردوو ناوچەی کەرکوک و هەولێر ساڵی (١٩٢٠)**

**د. عوسمان عەلی**

تا رادەیەك ناوچەی هەولێر ئارام بووە، کە لە ساڵی (١٩٢٠) بووە مەڵبەندی بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتی بەریتانیی، (نووری باویل) ئاغای سەرۆکی خێڵ لە رەواندز[١]، خۆی بۆ پایەی هاوشێوەی شێخ مەحموود ئامادە کردبوو، بۆ هێرشی دژ بە بەریتانیا توانی بووی سورچی و خۆشناو و ئەوانی تر لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە، بە ناوی جامیعەی ئیسلامییەوە ئەو راپەرینانە لە دژی بەریتانیا بورووژێنێ، دووبارە لە ئەیلولی ساڵی (١٩٢٠) پیاوەکانی نوری باویل ئاغا بە پشتگیریی سورچییەکان شاری رەواندزیان گەمارۆدا، لەو کاتەدا (نەقیب های) خەریك بوو هێزێکی خێڵەکی دۆستی بەریتانیا پێکبهێنێ، کارەکە بەهۆی فەتوای شێخەکانەوە پەکی کەوتبوو، بەریتانییەکان رەواندوزیان بە جێهێشت و شوێنکەوتوانی نوری ئەنجومەنێکی خێڵەکییان بۆ بەرێوەبردنی شارەکە هەڵبژارد[٢].

Bell Review of Civil Administraion p 75- 76 noel diary p 23 Halmreich p 204 .

لەبابەت ئەم ئەنجومەنەوە ئەحمەد تەقێ لە بیرەوەرییەکانی دەڵێ: (کۆمەڵی شەعبیان تەشکیل کرد، بەم نوعە شێخ رەقیبی بجێل سەرۆك و من نائب سەرۆك و شێخ عوبێدوڵڵا و شێخ جەوادو شێخ کاك ئەمنی سەلان و غەفورخانی ناوەشت و باوەیل ئاغا و خدر ئاغای سەرچیاو سەعید بەگی برادۆست ئەندام... بۆ تەشکیلاتی ئیدارییش ئەحمەد بکۆك قائیمقامی رەواندوزو نوری ئەفەندی باوەیل ئاغا سەرۆکی ئەمن، شەوکەت ئەفەندی سەرۆکی شارەوانیی و مستەفا ئەفەندیی رەواندوزیی بە مودیری ماڵ قبوڵ کرا...) بڕوانە: بیرەوەرییەکانی ئەحمەد تەقی دەربارەی شۆڕشەکانی شێخ مەحمودو سمکۆ سلێمانی (١٩٨٨).

کۆیە شارێکی بچووکی هاوتوخبی رۆژهەڵاتی هەولێرە، خەباتیان لە دژی ئیدارەی بەریتانیی راگەیاند، وایان دانابوو ئەو گرووپەی دژی سیاسەتی بەریتانیانەو داوای جامیعەی ئیسلامیی دەکەن خوازیاری ماڧ کوردانن[٣].

ئەمەش بووە هۆی ئەوەی لە (١٥)ی ئەیلول بەریتانیا لەژێر فشاری چڕی تێکۆشەران بە تەواوی ئەو هەرێمە بەجێبهێڵێ، هێزە سەربازییەکانی بەریتانیا کشانەوە دەورووبەری شاری هەولێر، دەسەڵاتی بەریتانیا بە تەنیا لە ناوەندی شار مایەوە، هەڵوێستی نەقیب (های) کەوتە مەترسییەوە، زۆربەی سەرکردەکانی هۆزی دزەیی، کە قورساییان لە ناوچەکەدا هەبوو لە ئیدارەی بەریتانیا رازی نەبوون و داوایان لە نوری کرد دەست بخاتە کاروباری هەولێرەوە، لە ئەنجامدا هێزێکی تایبەت لە سورچی و خۆشناو لە چەند لایەکەوە هێرشیان کردە سەر هەولێرو گرتیان، ویلسن فەرمانی بە (های)دا شار بە جێبهێڵێ. های دۆسیەو تۆمارەکانی میری ناردە کەرکوك و پێی باش بوو لە هەولێر بمێنێتەوە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ هەڵگەراوەکان و پەرتەوازە پێکردنیان، هەروەها (ویلسن)یش بۆ بەرزکردنەوەی ورەی دۆستەکانی سەردانێکی لەناکاوی هەولێری کرد، لە کۆبوونەوەیەکیدا دۆستایەتی سەرۆکی دزەیی و پیاوماقوڵانی هەولێر لە بەرژەوەندیی بریتانیا مسۆگەر کرد، هەڵوێستی بریتانیا لەدوای ئەو دوو کەتیبەیە بەرز بووەوە، ئەم گۆرانکارییە خەباتکارانی ناچار کرد گەمارۆ لەسەر شار هەڵبگرن[٤].

هۆکاری راپەرینەکانی هەرێمی هەولێر لەگەڵ هی سلێمانی و بادینان پێك دەچوون، سەرۆکەکانی دزەیی کەلە رۆژگاری دەسەڵاتی عوسمانیی رۆڵی سەرەکییان دەگێرا، ئێستا لەلایەن (های) لە بیر کراون، غەیری کوردیان لە کۆکردنەوەی باجی ناوچەکە دامەزراندووەو بە نادادگەریی باج کۆ دەکەنەوە، نارەزایی سەرۆکەکانی دزەیی لە ئاکامی بێبەشکردنی ئەو دەستکەوتانەوە بوو کە هۆزەکانی پشدەرو جاف لە لیوای سلێمانی هەیانبووە، سەرەرای ئەمەش (های) داوای لێکردن سەردانی بکەن، لە (٨)ی ئەیلول سەردانیان کرد، بەڵام سۆن هێشتنییەوەو بەتووندیی لەگەڵیان جوڵایەوە، چونکە هاریکاری ئیدارەی بەریتانییان نەکردووە، های فەرمانی بە هەموو ئاغاکانی دزەیی کرد بۆ ماوەی شەش مانگ سەد پارچە چەك و (١٥٠٠)روپیە بدەن، بە مەرجێك لە هەولێر دەرنەچن هەتا ئەو مەرجانە جێبەجێ دەکەن، ئەمانە هەمووی بۆ لێدانی سەرداره کوردەکان بوو[٥].

نەبوونی سیاسەتێکی روونی بەریتانیی بەرامبەر کوردو دەستێوەردانی دەرەکیی رۆڵی گرنگیان گێرا لە راپەرینی سلێمانی، لە راپەرینی هەولێریش دوو هۆکاری گرنگ هەبوون، کوردو فەرمانبەرەکانی عوسمانی لەوێ کۆمەڵەیەکی ئیسلامیی دوژمن بە ئینگلیزیان پێکهێنا بوو، کە لە پەیوەندیی هەمیشەییدا بوون بە هێزە ناسیۆنالیستە تورکەکانەوە، ئەندامانی کۆمەڵە نووسراوێکیان نووسی و دۆستایەتی و مەیلیان بۆ لای جامیعەی ئیسلامیی دیارخستبوو، پروپاگەندەیان دەکرد کە دووبارە تورکان دەگێرنەوە ناوچەکە، ئەمەش خەڵکی زۆری والێکرد هاوکاری لەگەڵ حکومەتی بەریتانییدا نەکەن[٦].

کۆمیساری باڵا بە وەکالەت لە سەردانەکەی بۆ هەولێر سەرنجی دابوو، کە بەریتانیا لە توانایدا نییە سیاسەتێکی روون دابرێژێ لەسەر داهاتووی ویلایەتی موسڵ، کە بۆتە پەشێویی گەورە لەناو کورد، لەدوای ئەوە پیاوماقوڵانی هۆزەکان فشاریان خستبووە سەر ویلسن کە راگەیاندنێك دەربکاو دڵنیایی بدات کە حکومەتەکەی رێگەی گەرانەوەی تورکان نادات، ئەمەش لە توانای ویلسندا نەبوو، کوردەکانیش پێیانوت: ئەگەر تورکمان گەرانەوە دەمانکوژن و ئافرەتانمان دەرفێنن[٧].

شۆڕشی (١٩٢٠) کاریگەریی هەبووە لەسەر کوردستان، سەرەرای هەوڵەکانی ویلسن بۆ پوچەڵکردنەوەی پەیوەندیی نێوان شۆڕشی عێراقی و راپەرینی هەولێر، ئەندازەیەکی زۆر لە کاربەدەستانی بەریتانیی ئاماژەیان بە چالاکییەکانی هەولێر کردووە، کە پروپاگەندەیان بۆ بەرژەوەندیی راپەرینی

عێراقی کردووەو نووسراویان دابەش کردووە، کە گوزارشتی هاوکاریی بووە لەگەڵ تێکۆشانی دژ بە حکومەتی بەریتانیی، لە راستیدا لە مانگی ئابەوە لە هەولێر بەرەنگاربوونەوەی کارا هەبووەو توانیبویان پشتگیریی زۆربەی خەڵك بەدەستبهێنن[8].

راپەرینی عێراقی شوێنەواری لەسەر خانەقین و کفری و کەرکوك بەجێهێشت، لە مانگی ئابدا لێوەشاوەترین کوردانی دانیشتووی بەغداو کەرکوك بەشداریان لەو راپەرینەدا کرد، لەوێ هۆزەکانی کورد هێرشیان کردە سەر کۆمپانیا پەترۆڵیەکانی ئینگلیز - ئێران و لە (٢٢)ی ئاب شۆرشگێران ئاڵای بەریتانییان سووتاند، لە کفری و خانەقین ئاڵای عوسمانییان بەرزکردەوە، هۆزەکانی دەلۆو جاف هێزیان کۆکردەوە بۆ دەرپەراندنی ئیدارەی بەریتانیی لە ناوچەی نێوان توزخورماتوو کەرکوك، کە هۆزەکانی داودەو بەیات و زەنفاناو ئالی ئەلعەزیزی عەرەبی لێ نیشتەجێن، لە کۆتاییدا بەری رۆژهەڵاتی کەرکوك کەوتە بەردەستی شۆرشگێرانی کورد و حکومەتی بەریتانیی ناچارکرا لە زۆربەی ئەو ناوچانە دەربچێ، بە تەنیا دەستەڵاتی لە شاردا مایەوە[9].

هەڵگەرانەوەی چەکداریی لە کەرکوك و خانەقین و عێراق بە گشتیی هۆکارەکانی فرە رەهەندو کارتێکەری جیاوازی هەبووە، هاندانی زانا شیعەکانی شوێنە پیرۆزەکانی عێراق کاریگەریی هەبووە لەسەر شیعەکانی کورد لە خانەقین و ناحییەکانی باشووری کەرکووك، ئەندامانی عەهد (گردبوونەوەی نەتەوەیی عێراقی - التجمع القومي العراقي) لە دیمەشق چالاکانە لەناو کورد کاریان دەکرد، هەندێ لە چالاکییەکانیان بیری سەربەخۆیی نیشتمانی و دوژمندارێتی بێگانەیان تێکەڵ کردبوو، بیری جامیعەی ئیسلامییان کە لە تورکیاوە هاتبوو بڵاودەکردەوە، هەروەها هەندێك لە شوێنکەوتوانی شێخ مەحمود دەیانویست بارێکی نائارامیی لە ناوچەکە درووست بکەن، هەتا فشار لەسەر ئینگلیز درووست بکەن بۆ راگەیاندنی فەرمانرەوایەتی شێخ مەحمود[10].

لە میانی رێوشوێنی بەرگریی ئینگلیزەکان توانیان دەست بەسەر راپەرینەکەدا بگرن و نەیەڵن بپەرێتەوە ناوچە گرنگەکانی سلێمانی و بادینان، ئەفسەری سیاسیی لە کەرکوك هەولیدا شێخ حەبیب تاڵەبانی، کە خاوەنی دەسەڵاتێکی گەورە بووە لە کەرکووك بەکاربهێنێ بۆ هێمنکردنەوەی دانیشتووانی نێوان کەرکووك و خانەقین و نیشتەجێکردنی پیاوانی ئەو هێزە چەکدارانە لایەنگری بەریتانیا بوون، حکومەتی بەریتانیا رەشبگیری بە (٧٠٠) پیاوی سەنجابی کرد لەگەڵ هەندێ لە کەڵهورییەکانی کوردی ئێران - لۆنگرێك بە پاڵپشتی رەشبگیرییەکەی حکومەت هەولی دەرپەراندنی وەکو خۆی وتویەتی یاخیبوان لە کفری و خانەقین دا[11]. لەگەڵ رێوشوێنی بەرگریی بە دابرینی سلێمانی لە عێراق[12].

سۆن چەند رێوشوێنی تری لە سلێمانی گرتەبەر، لە هێنانی پێنج سەد کەس لە هۆزی پشدەر بۆ شارەکە، بەدرێژایی گرژییەکە هێزە سەربازییەکان لە لیوایەکە مانەوە، هەرچۆنێك بێت لە سلێمانی کۆسپی خستە بەردەم کورد هەتا شۆرش نەکەن[13].

هۆکاری راپەرینی (١٩٢٠) لە هەولێرو کەرکوك هەمان هۆکاری راپەرینی ساڵی (١٩١٩)ی سلێمانی و بادینان بووە، نیگەرانی کورد لە هەوڵەکانی پیادەکردنی دەسەڵاتی راستەخۆی حکومەتی بەریتانیی لە ناوچەکە، وەکو نیگەرانی پێشوو بووە لە سیاسەتی مەرکەزیی، کە کۆمەڵی ئیتحادو تەرەقی لە تورکیا پیادەی کردبوو، دوای شەری یەکەمی جیهانیی لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیا هەمان سیاسەت پەیرەو دەکرا، ئەمەش ئەگەر هەر مەبەستێك بگەیەنێ، بەڵگەیە لەسەر پەند وەرنەگرتنی ئینگلیز لە ئەزموونی تورکە ئیتحادیەکان لەگەڵ کورد.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:-

١- نوری باوەیل ئاغا ناوێکی درەوشاوەیە لە نەوەکانی ڕەواندوز، لە ساڵی (١٩١٩) موجەنەددی پۆلیسی بەریتانی بووە، بەهۆی مەیلداریی بۆ جوڵانەوەی ئیسلامیی و بڕوای بە زۆرلێکرداویەتی کورد، لە ساڵی (١٩٢٠) شۆرشی بە رووی ئینگلیزدا ڕاگەیاند، بۆ کۆکردنەوەی پشتگیریی هۆزەکانی کورد هەموو ناوچە دوورەکانی دەورووبەری ڕەواندوز گەڕا، ڕایگەیاند حکومەتی بەریتانی هیچ شتێك بۆ کوردستان ناگەڕێنێتەوە، (های) بە هەرەشەیەکی مەترسیداری دانابوو بۆ سەر دەسەڵاتی بەریتانی لە هەولێر، نوری باوەیل ئاغا شۆرشگێر بوو، بە دلسۆزییەوە خزمەتی شێخ مەحمودی کردووە، دوژمنی سەرسەختی (های) بوو، های هەولێکی زۆریدا دووری بخاتەوە، بەڵام ئەم شێوازی پارتی زانی (الکرو الفر)ی بەکاردەهێناو شۆرشگێرێکی ئازا بوو.

FO 371 / 5068 W . Hay note rawanduz B 71 / 6346 Two years 261

لەبابەت ئەم ئەنجومەنەوە ئەحمەد تەقیٚ لە بیرەوەرییەکانی دەڵیٚ: (کۆمەڵی شەعبیان تەشکیل کرد، بەم نەوعە شێخ ڕەقیبی بجێل سەرۆك و من نائب سەرۆك و شێخ عوبێدوڵڵاو شێخ جەوادو شێخ کاك ئەمنی سەلان و غەفورخانی ناودەشت و باوەیل ئاغا و خدر ئاغای سەرچیاو سەعید بەگی برادۆست ئەندام... بۆ تەشکیلاتی ئیدارییش ئەحمەد، بکۆك قائیمقامی ڕەواندوزو نوری ئەفەندی باوەیل ئاغا سەرۆکی ئەمن، شەوکەت ئەفەندی سەرۆکی شارەوانیی و مستەفا ئەفەندیی ڕەواندوزیی بە مدیری مال قبول کرا...) بڕوانە: بیرەوەرییەکانی ئەحمەد تەقی دەربارەی شۆرشەکانی شێخ مەحمودو سمکۆ سلێمانی (1988).

2-Hay . Two years . pp . 303 - 305.

3-Hay .Two years . pp 87- 89 . Cab 24/ 111/ Teleg .from Civil commissioner to . S. for India . C. p 1892 Ghulami. Pp. 89- 90.

٤- د. کمال مظهر: دور الکرد في الثورة العشرین:

Wilson . Loyalties . 11. p . 289 – 287 - 5٥ –Air 20/ 513 Report on Arbil. S Marry. APO Erbil . 15- 7- 1920. 20/ 512

Note on Unrest. Amongst the Diza Kurds: hay Two years pp 87- 89

Hay . Two years . p 161 - 6

Wihson. Loyalties . 11. P 87- 28 - 7 – ٨Wilson. Lbid: p. 285 –

٨- Wilson Ibid: p. 285 hay Two years p. 296 – 297.258 دور الکرد في.. ص

" سەرچاوەیەکمان لەبەردەستدا نییە لەسەر ئەو هۆزە عەرەبییانە، بەڵام هۆزی داودە کوردن، وەرگێر"

9- Edmonds: Kurd. Turk. And Arabs. P. 299 – Wilson Loyalties 11 . p. 284 – 285

10- Wilson Loyalties. 11. P. 290

11 –Office of Civil Commissioner Report on Iriq 1920 – 1922 21 - 20 3ئەحەد خواجە چیم دی، ب

12- Longing: Iraq form 1990 – 1950 p 125. Cab 24/ 111. Teleg from Civil Commissioner Baghdad to Sec of State for India 101920 - 9 -

١٣- د. کمال مظهر: دور الکرد في ثورة العشرین، ص ٥٣٥.

*** سایکس - پیکۆو کێشەی کەرکوك:-**

**فەرید ئەسەرسەرد**

کرۆکی رێککەوتننامەی (سایکس - پیکۆ) رێکخستنی پرۆسەی دابەشکردنی زەوییەکانی دەوڵەتی عوسمانییە لەنێوان بریتانیاو فەرەنساو لەم چوارچێوەیەدا رێککەوتننامەکە هەردوولای سەرپشك کردووە کە بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان مامەڵە لەگەڵ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان بکەن. ئەمەش بەم مانایە دێ کە شتێك نییە ناوی سنووری (سایکس-پیکۆ) بێ، چونکە رێککەوتننامەکە ناوچەکەی بەسەر چەند قەوارەیەکی سیاسیدا دابەش نەکردووەو هیچ سنوورێکیشی نەکێشاوە، لە راستشیدا رێککەوتننامەکە لە کاتێکدا واژۆکراوە کە تێیدا هەردوولایەنە سەرەکییەکە لە بەزینی دەوڵەتی عوسمانی دڵنیا بوون، بۆیە مەسەلە سەرەکییەکە زۆرتر پەیوەندی بەوەوە هەبوو کە چۆن بەریتانیاو فەرەنسا هاوکاریی یەکتری بکەن و چۆن ناوچەکە لەنێوان خۆیاندا دابەش بکەن بۆ ئەوەی هەریەکێکیان سنووری خۆی بزانێت و دەست بۆ ناوچە دەستنیشانکراوەکانی ئەوی تر نەبات.

چەمکی شارستانییانەی داگیرکردن لەناو (سایکس-پیکۆ) وون نییە. پەیدابوونی بەریتانیاو فەرەنسا لە عێراق و کوردستان و سوریا، ئەو وڵاتانەی لە قۆناغی پێش سەرمایەدارییەوە بۆ قۆناغی سەرمایەداری گواستنەوە بەرەو شارستانێتییەکی پێشکەوتووتر پەلکێشی کردن. بەهاکانی داگیرکەرە تازەکان چەمکی وایان تێدا بوو کە لە رۆژهەڵاتدا لە سایەی حوکمی عوسمانییەکان و بیروباوەڕی عوسمانیزمدا باو نەبوون لە سەرووی هەموویانەوە چەمکەکانی دەوڵەتی نیشتمانی، سەروەری یاسا، مافەکانی هاووڵاتیبوون، هەڵبژاردن، مافی رادەربڕین و هی تر.

لە دیکۆمێنتە بەراییەکانی رێککەوتننامەکەدا، کوردستانی باشوور بەسەر دوو کەرتدا دابەشکراوە، یەکێکیان کەرتی سەرووی زێی بچووکە کە هەولێرو بادینان دەگرێتەوە بەشێك بووە لە پشکی فەرەنساو ئەوی دیکە کەرتی خوارووی بچووکە کە سلێمانی و کەرکوك دەگرێتەوەو بەشێك بووە لە پشکی بەریتانیا هەموارکردنەوەی دواتری رێککەوتننامەکە، پاش برانەوەی جەنگی یەکەمی جیهان، کەتێیدا فەرەنسا دەستبەرداری کەرتی سەرووی زێی بچووك بوو بۆ بەریتانیا، یەکپارچەیی کوردستانی باشووری پاراست.

مەسەلەکە بەهەر شێوەیەك لێك بدرێتەوە لەو چوارچێوەیە ناترازێ کە (سایکس-پیکۆ) کوردستانی باشووری لەو داگیرکارێکەوە رادەستی داگیرکەرێکی تر کردووە، ئەمەش راستەوخۆ دەمانخاتە بەردەم ئەو راستییەی کە لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهاندا کورد هیچ پرۆژەیەکی دەوڵەتی نەبووە تا بەهۆی (سایکس - پیکۆ)وە لەدەستی بدات، بەپێچەوانەوە کوردستانی باشوور پاش پەیدابوونی بەریتانیا لە ناوچەکەو دەرچوونی عوسمانییەکان لەولایەتی موسڵ، چەند چانسێکی بۆ پێکهێنانی قەوارەی نەتەوەیی بۆ هەڵکەوتووەو لە سایەی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکاندا هیچ کات ئەو چانسانەی بۆ هەڵنەکەوتووە لە سەرەتادا کوردی باشوور چانسی پێکهێنانی قەوارەیەکی (بە چارەنووس هەڵپەسێردراوی) چنگ کەوت کە تێیدا ئەگەری سەر بەخۆیی یان گەرانەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی تورك وەك (قەوارەیەکی ئۆتۆنۆم) یان لکاندن بە عێراقەوە وەك (قەوارەیەکی نیمچە فیدرال) بۆی رەخسا.

پاش واژۆکردنی پەیمانی ساڵی (١٩٢٠)ی سیڤەریش چانسی پێکهێنانی قەوارەیەکی سەربەخۆیان یەکگرتنەوەی لەگەڵ کوردستانی باکوور لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆی یەکگرتوودا بۆ کوردستانی باشوور هاتە ئاراوە، هەرچەندە هیچ لەم ئەگەرانە جێبەجێ نەکران، بەڵام دوای ئەوەی هەر سێ ویلایەتە عوسمانییە دێرینەکەی موسڵ و بەغداو بەسرە بوونە بەشێك لە پشکی بەریتانیا، چانسی کوردستانی باشوور لە تاك ئەگەرییەوە (مانەوە وەك بەشێکی جیانەکراوەی تورکیا) بووە فرە ئەگەری، کە کورد لە هیچ ئەگەرەکان سوودمەند نەبوو.

لە ساڵی (١٩١٨)، بەریتانیا ئەو توانایەی هەبوو کە دەوڵەتێك بەمەرجەکانی خۆی بۆ کوردی باشوور دابمەزرێنێ، پێشهاتەکانی ناوچەکەوشێوەی مامەڵەی کورد لەگەڵ بەریتانی و پەی نەبردنی کورد بە رەوشی ناوچەیی و جیهانی و شکستی پرۆژەی پەیمانی سیڤەر، بەرە بەرە بەریتانیایان هاندا بیر لە پێکهێنانی دەوڵەت بۆ کورد نەکاتەوە.

*سەرچاوە:-

- رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (٧٠٤٩)، ساڵی (٢٠١٦).

## * ڕێکەوتننامەی سیڤەرو کەرکوك

فەرید ئەسەسەرد

پەیمانی سیڤرە کە لە کاتژمێر (٤:١٠) خولەکی ڕۆژی (١٠)ی مانگی ئابی ساڵی(١٩٢٠) لە شارۆچکەی (سیڤرە)ی نزیکی پاریس لە فەرەنسا واژۆ کرا، لێرەدا تەنها ئەو سێ مادەیەی کە پێوەندییان بە دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانەوە هەیە دەخەینەڕوو.

* مادەی ٦٢

لیژنەیەك لە قوستەنتینیە (ئەستەمول) دانەنیشێتو لە سێ ئەندام پێکدێتو دەستنیشاندەکرێن لەلایەن بریتانیا، فەرەنسا، ئیتالیا، بەدوای یەکدا- بۆ ئەوەی لە ماوەی شەش مانگدا لە ڕۆژی بەجێهێنانی ئەم پەیماننامەیەوە دەستبەکارین پڕۆژە یاسایەکی ئۆتۆنۆمی خۆماڵی ئامادە دەکەن بۆ ئەو ڕووبەرانەی زۆرینەی دانیشتووانی کوردنو دەکەونە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فورات بەرەو باشووری سنووری خوارووی ئەرمینیا، کە ڕەنگە ئەویش پاشان بڕیاری مافی چارەی خۆنووسینی لەسەر بدرێت، هەروەها سنووری خوارووی نێوان تورکیاو سوریاو میزۆپۆتامیا وەکو لە مادەی ٢٧ (برگەی ٢و برگەی ٣) پێناسە کراوە، ئەگەر نەتوانرا کۆدەنگی لەسەر هەر کێشەیەك دابین بکرێت هەر ئەندامەو پرسەکە ڕووبەڕووی دەوڵەتی تایبەتمەندی خۆی دەکاتەوە، ئەو یاسایە، دەبێ پاراستنی ئاسوریی‌و کلدانو کەمایەتییە ڕەگەزو ئایینەکانی ئەو ناوچانە بەتەواوەتی بگرێتە خۆی وێرای ئەو ئامانجە لێژنەیەکی تر پێکدێت لە نوێنەرانی بریتانیو فەرەنسی‌و ئیتالی‌و فارس‌و کورد بۆ لێکۆڵینەوەو بڕیاردان سەردانی شوێنەکان دەکەنو بڕیار لەسەر هەر ڕاستکردنەوەیەك دەدەن، لەوێ هەر شتێك دەربارەی سنووری تورکیا بکرێ دەبێ بەپێی برگەکانی ئەم بەیاننامەیەبن، ئەو سنوورەی دەگونجێت لەگەڵ هاوسنووری فارس.

* مادەی٦٣

حکومەتی تورك بەپێی ئەم یاسایە دەبێ ڕەزامەند بێت لەسەر قبوڵکردنو جێبەجێکردنی بڕیارەکانی هەردوو لیژنەکە کە لە مادەی ٦٢دا باسکراوە لە ماوەی سێ مانگدا لە ڕۆژی گەیاندنی بڕیارەکانیان بە حکومەتی ناوبراو.

* مادەی ٦٤

ئەگەر لە ماوەی ساڵێکدا لە دەستپێکردنی جێبەجێکردنی ئەم پەیماننامەیە کوردەکان لەو ناوچانەی لە مادەی ٦٢دا دستنیشان کراون داوایان لە کۆمەڵەی گەلان (عوسبەت ئەلئومەم) کردو ئارەزووی خۆیان دەربڕی بۆ وەرگرتنی سەربەخۆیی لە تورکیاو کۆمەڵەی گەلانیش لەو خەڵکانەی ڕابینی کە توانای بەڕێوبردنی خۆیان هەیەو ڕاشی سپارد، دەبێ بیاندرێتی، تورکیا دەبێ ڕەزامەند بێت لەسەر



دەستەی باڵای واژۆکردنی پەیماننامەی سیڤەر

جێبەجێکردنی ئەو راسپاردەیەو دەستبەرداری هەموو مافەکانی بێت، ئەو ناوچانە رادەستی ئەوان بکات.
درێژەی برگەکانی ئەم وازهێنان و دەستلێهەڵگرتنە بابەتی رێکەوتنێکی جیا دەبێت لەنێوان هێزەکانی هاوپەیمانان و تورکیا.
بەڵام ئەگەر کاتی ئەو دەستلێهەڵگرتنە روویدا هیچ بەرهەڵستییەك نابێت لەلایەن دەوڵەتە هاوپەیمانە سەرەکییەکان لەسەر پێوەلکانی ئارەزوومەندانەی ئەو کوردانەی تا هەنوکە نیشتەجێن لەو بەشەی کوردستان کە (ویلایەتی موسڵ) بەو دەوڵەتە سەربەخۆیەی کورد.
لە (١٠)ی ئابی (١٩٢٠)دا سەرۆك وەزیرانی تورکیا فەرید پاشا لە پاریس پەیمانی سیڤەری لەگەڵ هاوپەیمانەکاندا ئیمزا کرد، ئەم پەیمانە چەند مەرجێکی قورسی بەسەر تورکیادا سەپاند لەوانە کەمکردنەوەی قەڵەمڕەوی ئەوروپایی تورکیا، سپاردنی بەشێکی هەرێمی تراکیاو شاری ئزمیر بە یۆنان و بەشەکەی تری هەرێمەکەو بەندەری شارەکە بەکۆمیسیۆنێکی نێودەوڵەتی، سپاردنی تەنگەکانی دەردەنیل و بۆسفۆرو دەریای مەرمەرەو دورگەکانی نزیکی بەکۆمیسیۆنێکی نێودەوڵەتی، رازیبون بەجیابوونەوەی ئەرمەنستان و کوردستان، داننان بە جیابونەوەی هەرێمە عەرەبنشینەکان و هی تر.
هاوکات لەگەڵ ئیمزاکردنی ئەم پەیمانەدا، بریتانیاو فەرەنساو ئیتالیا پەیمانێکی سێقۆڵییان لەگەڵ یەکتریدا ئیمزا کرد کە تێیدا قەڵەمڕەوەکانی دەسەڵاتی خۆیان لە تورکیا دیاری کرد.
سەرەرای بایەخی ئەم پەیمانە بۆ کورد کە یەکەم جار بوو لە دیکۆمێنتێکی نێودەوڵەتیدا مافی پێکهێنانی دەوڵەتی پێ رەوا ببینرێ، بەڵام پەشیمانبوونەوە لە جێبەجێکردنی پەیمانەکە، زیانێکی زۆری لە بەرژەوندییەکانی کورد دا.
بەهۆی ئەوەش کەمەبەستی سەرەکیی پەیمانەکە رێکخستنەوەی پەیوەندیی نێوان تورکیاو هاوپەیمانەکان بوو، ئەوەندەی کە پەیمانەکە بایەخی بە کوردستانی باکووری ژێر دەسەڵاتی تورکیا داوە، ئەوەندە بایەخی بە کوردستانی باکووری ژێر دەسەڵاتی تورکیا داوە، ئەوەندە بایەخی بە کوردستانی باشووری دەرەوەی دەسەڵاتی تورکیا نەداوە، لەم سەروبەندەدا ماددەی ٦٤ی پەیمانەکە مەسەلەی کوردستانی باشووری کردبووە مەسەلەیەکی لاوەکیی گرێدراوی کوردستانی باکوورو تەنها پاش ئەوەی کە کوردی باکوور بڕیار لە چارەنووسی سیاسیی خۆی دەدا، کوردی باشوور دەیتوانی بڕیار لە چارەنووسی خۆی بدا.
بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی لە کوردستانی باکوور، دوو مەرج دانرا کە ئەمانەن:-
١- رازیبونی زۆرینەی دانیشتوان بەجیابونەوە لە تورکیاو ئاگادارکردنەوەی کۆمەڵەی گەلان لەم بارەیەوە.
٢- رازیبونی کۆمەڵەی گەلان بەجیابوونەوەی کوردی باکوور پاش ئەوەی کە لە جیابوونەوەکە دەکۆڵێتەوەو بە گونجاو و شایستەی دەزانێ.
لەم سەروبەندەدا ئەگەر کوردی باکوور لە تورکیا جیا ببوایەتەوە، کوردی باشوور دەیتوانی بچێتە پاڵییەوە، خراپترین لایەنی ئەم ماددەیە هێشتنەوەی چارەنووسی کوردستانی باشوورە بە هەڵپەسێردراوی چونکە کوردستانی باشوور بە هۆی ئەم پەیمانەوە نە دەیتوانی سەربەخۆیی بەدەست بێنێ نە دەشیتوانی بچێتە پاڵ عێراق.

### * شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ لە ساڵی (١٩٢٠) لە کفری:-

مستەفا نەریمان

که سوپای بەریتانی سەرتاپای خاکی دەستە چەپی رووباری سیروانی داگیرکرد، ویستیان لە سیروان بدەن و هێرش بەرنە سەر بنکەکانی سوپای تورك کە لەدەستە ڕاستی سیروان بوون فەرماندەی هێزی ژمارە سیانزدەی تیپی شەشەمی ئەو هێزە شەوی ٣/٤ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩١٧ کشایەوە شوێنێکی نوێ لە باکووری (قەرتەپە)، هەر ئەو شەوە سوپای بەریتانیا پردێکیان دروست کردو پەڕینەوە ئەوبەری سیروان لەبەرئەوەی تورکەکان ئەو پێدەشتەیان بەلافاو نقوم کردبوو، جموجۆڵی سوپای بەریتانیایان پێ دواخست بەچەشنێك تا چواری مانگ نەیانتوانی لە پردی (نارین) بگەنە ئەوبەر. جەنەراڵ (ئیگرتن)ی فەرماندەی هێزی ژمارە سێی بەریتانیا لەبەرەبەیانی ڕۆژی پێنجی مانگدا فەرمانی هێرش بردنیدا بەدوو بەتالیۆن و کەتیبەیەك سوارەو چوار زرێپۆش هێرشیان بردە سەر سوپای تورك کە بەدوو میل لە باکووری (قەرتەپە) وە دوور بوون، شەڕ چوار ڕۆژ[1] لەنێوان هەردوو سوپا لەو ناوچەیە دەوامی کرد، لەم شەڕەدا (٢٣٠) کەس لە سوپای بەریتانیاو (٥٠٠) کەسیش لە سوپای تورك کوژراو (٢٢٥) کەسیشیان لێ بەدیل گیرا، بۆ هێزەکانی بەریتانیا دەرکەوت لەمەولا هەروا بەئاسانی و بێ زەرەرو زیان ناتوانن بەرەو پێشەوە تەکان بدەن لەبەر ئەمە ڕۆژی حەوتی کانونی یەکەم لە قەرەتەپە کشانەوەو لە سیروانیش پەڕینەوە دیوی خۆیان، دوابەدوای ئەوان سوپای تورك ڕۆژی ٩ی کانونی یەکەم قەرەتەپەیان گرتەوە[2].

سوپای بەریتانیا هێزەکانی خۆیان کۆکردەوەو ڕیزی خۆیان ڕێکخست و بەهێزێکی گەورەوە جارێکی تر لە سیروان پەڕینەوە، سوپای تورك ئەمجارە بەرەنگاریان پێ نەکرا بەرەو دوا کشانەوە، مەیدان بۆ ئینگلیزەکان چۆڵ بوو، هۆزەکانی ئەو ناوچەیە بەهاتنەوەی بەریتانیایان پێ ناخۆش بوو هەندێکیان بڕیاری بەرەنگاری کردنی ئەو سوپا گەورەیەیاندا، لەکاتێکدا سوپای تورك خۆی بۆ ڕانەئەگیرا لە دەورووپشتی گوندی (فەککە)ی لای (برایم سەمین) دوو چەکداری دەلۆو یەکێکی گێڕ[3] قسەیان کرد بەیەك و دەستڕێژێکیان لە زرێپۆشیەکی ئینگلیز کرد، ئەوانیش لێیان هاتنە دەس (حوسێن کاکەمند)یان لێ کوژرا، ئەمە یەکەم شەهیدی دەلۆییە کە سوپای بەریتانی خوێنیان ڕژاند، تەرمی شەهید لە مەزارگەی (برایم سەمین) بە خاك سپێردرا، سوپای بەریتانیاش بێ ئەوەی تورکێك بەرەنگارییان بکات تەکانیاندا ڕۆژی (٢٤ی ئابی ساڵی ١٩١٨) شاری کفرییان داگیرکرد، ساڵێك بوو بەهۆی شەڕی نێوان تورك و ئینگلیز ڕێگەی بەغداد لەم شارەولە هەموو کوردستان بڕابوو، زستانی ئەم ساڵەش بێ باران بوو، ئازوقە زۆر کەم بووو گرانییەك سەری



هەڵدابوو، سوپای بەریتانی هەستیان بەمە کردبوو هاتن بۆ دڵنیاکردنی ئەو خەڵکە چەند ڕۆژێك لەسەریەك سەمونیان بەسەر ئەو خەڵکەدا دابەش کرد تا چەند ڕۆژێك لەوەوپاش ڕێگەی بەغداد کرایەوەو بازرگانی جووڵایەوە ئامشۆکردن دەستی پێکردەوە کاروان لە سلێمانییەوە بەرەو خواربووەوە.

لە سەرەتای ساڵی (١٩٢٠) حکومەتی بەریتانیای داگیرکەر هێڵی شەمەندەفەری گەیاندە ئاوایی (کنگربان) کە بە دوانزدە کیلۆ مەترە ئەکەوێتە ڕۆژئاوای کفرییەوە تا سێ ساڵ ئەو هێڵە لە کنگربان بەرەو کەرکوك تێ نەپەڕی، لەبەرئەوە کفری و ئێستگەی ئەو گوندە بوو بەدەرگایەکی سەرەکی بۆ کاروانی کەرکوك و هەولێرو سلێمانی، دانیشتووانی کوردستان کە بەرەو بەغدا برۆیشتنایە ئەوا ئەهاتنە کفری و باروبار خانەیان ئەخست لەوێوە سەعاتە ڕێیەك بەسواری ئەچوونە ئێستگەی (کنگربان) ئەو شەوەیان لە شەمەندەفەر ئەبردە سەر بۆ ڕۆژی دووەم لەگەڵ گزنگی هەتاو کەوتندا لە بەغدا بوون، بەمە ڕێگەی چوار ڕۆژیان بوو بە چوار پێنج سەعاتێکی ناو قەتار.

پاش ئەوەی ئینگلیزەکان کفریان داگیر کرد، سەربازگەیەکیان لەنێوان گردی (ئەسکی کفری)و ئاوایی (کنگربان) دروست کردو هێزە سەرەکییەکەیان تیادا جێگیر کردو هێزێکی بچووکیان بردە ناو شاری کفرییەوەو کاپتن (ج. ایچ. سلمنت)[4] کرا بە جێگری حاکمی سیاسی[5] ئەو شارە دوو ئەفسەریش دانرا بۆ یارمەتیدانی (سلمنت) لە بەڕێوەبردنی کاروباری شاردا (یەکەمیان) ساجن مێجر (مێر) ناوێك بوو ئەمیش هەر جوولەکەیەکی بەریتانی بوو

هەمیشە کوتەکێکی بەدەستەوە بوو لە بەر ئەمە لەناو خەڵکدا بە (ئەبو چۆماغ)[٦] ناوبانگی دەرکردبوو (دووەمیان ئەفسەرێکی تر بوو ساچمە زەنێکی بەشانەوە بوو بەبیانووی سەگ کوشتنەوە بەکوچەو کۆڵانەکانی ناو شاردا ئەسورایەوە بەراستو چەپدا بۆ خۆنواندن تەقەی ئەکرد ئەم کابرایەش لەناو خەڵکدا بە (کوپپەك ئوێلدران)[٧] ناوبانگی دەرکردبوو هەردوو ئەفسەرە بەریتانیاییەکە وەختو ناوەخت بەناو شاردا ئەگەرانو ئەگەر یەکێکیان لەسەر جۆگە ئاوەکە چاو پێ بکەوتایە دەستنوێژ ئەشوا ئەوا دایان ئەپلۆسیو ئەیان شاخاندە سەر منداڵو ئافرەتیشا گوایە ئاوی جۆگەکەیان لێخن کردووە، لەناو بازاردا کە تێپەر ئەبێ خەڵکەکەیان لەبەر هەستێو ڕێزیان بگیرێتو هەرچی سڵاوی لێ نەکردنایە ئەوا دارکاری ئەکرا، لەلایەکی ترەوە ئەگەر لادێییەك نەقیزەی بژنایەتە گوێدرێژەکەی ئەوا خۆیان نەقیزە ژەن ئەکرد تاوەکو بەزەیی ئینگلیز بۆ حەیوان دەربڕن، لە قوتابخانەشدا کوتەك بەدەست وانەی ئینگلیزی ئەوتەوە منداڵەکان بەدەستییەوە زیرەیان ئەهات، دانیشتووانی شار لە کارو کردەوەی دەستو دایەرەی (سلمنت) زۆر دڵپەست بوون چەند جارێك دادیان بردە بەر (سلمنت) ئەویش لە کردەوەی ئەوان خۆی کەرو لاڵ کردبوو، زوڵمو زۆرو کاری ناهەمووارو کارکردنو بێگاری ئەم ئەفسەرانە لە ئەندازە بەدەربوو، چەند جوولەکەیەکی ناو بازارو چەند دەرەبەگێکی زۆردار دەوری (سلمنت) یان دابوو بە ڕۆژ دەرەبەگەکانی لابوو شەوانیش خۆیو ئەفسەرەکانی لەناو خزمەکانیاندا بوون، لەو حەلەیش لەناو خەڵکدا دەنگوباسێك بڵاوبووەوە کە (سلمنت) شێخ وەهابی تاڵەبانی بۆ قایمقامی کفری هەڵبژاردووە. دانیشتووانی شار ئەوەندە دادیان بەرز کردەوە لە کاربەدەستانی بەریتانی دەستیان شت چوون سکاڵایان بردە لای (برایم خانی دەلۆ) بەڵکو ئەو بتوانێت ئامۆژگاری سلمنت بکاتو کاری تێبکات، بۆ ڕۆژی دووەم برایم خانو ئەکبەری برایو چەند کەسێك چوونە کفریو خۆی چووە سەر (سلمنت) لە کردەوەی دەستەو پەیوەندەکەی ئاگاداری کردو داوای لێکرد جڵەویان بگرێتەوە، چونکە دانیشتووانی شار لێیان بێزارن هەروەها لە دەنگوباسی هەڵبژاردنی شێخ وەهاب بۆ قایمقامییەتی کفری هەواڵی لێپرسی ئەو دەنگوباسەی بەرپەچ دایەوەو بەڵێنیدا دڵی دانیشتووانی شار نەرەنجێنێو دەستدرێژی کردنیان لەسەر هەڵبگرن، هەروەها سەرنجی سلمنتی بەوە راکێشا کە کفری کەوتووەتە ناوجەرگەی دەلۆوە ئەبێ سەنگو کێشی ئەم هۆزە رەچاو بگرنو بە هیچ کلۆجێك نابێت گوێ رایەڵی شێخ وەهاب بکەن، برایم خان خۆی سوارەکانی بەناو شاردا گەڕانەوە لە کۆڵانێکدا هەستیان پێکرد لەلایەن دوژمنانەوە بۆسەیەکیان بۆ نراوەتەوە ئەمانیش دایان بەسەریانداو تەقەیان لێکردن پیلان گێران لە ترساندا کۆڵان بە کۆڵان کشانەوە دواوە.

برایم خان لە پیلانو دوژمنایەتی ئینگلیزەکان زیاتر وریا بووەوە لەوە دڵنیا بوو هەمیشە دژایەتی لەگەڵ هەموو نیشتمانپەروەرێك ئەکەن، دەستو پێوەندی (سلمنت) لەوسا زیاتر پێیان لێهەڵگرتبوو خەڵکیان تووندتر ئەچەوساندەوە خەڵکەکەش هاواریان هەر بۆ برایم خان ئەهێنا لەولاشەوە شێخ وەهاب کاربەدەستانی دەمەزەردتر ئەکرد، هیچ چارەیەکی تر لەوە زیاتر بەدەستەوە نەما کە ئەبێت دەست بدەنە چەكو لە دوژمن راپەڕن، پێش ئەو هەنگاوە برایم خان پەیوەندی بە دەلۆییەکانی خانەقینەوە کرد (خورشید بەگ) ئامادەیی راپەڕینی پێشاندا لەولاشەوە پەیوەندی لەگەڵ (ڕەفعەتی سمایل بەگی داودە) کرد ئەویش لە بەریتانییەکان پەست بوو بڕیاریدا بەهاوکاری کردنی هۆزی (بەیات) شاری (دووزخورماتوو) لە چنگ سوپای بەریتانیا رزگار بکەن، جا پێش ئەوەی بچینە ناو شۆڕشی کفرییەوە ئاورێك لە شۆڕشگێرانی خانەقیو دووز بدەینەوە بزانین ئاخۆ شۆڕشگێرانی ئەو دوو شارە چۆن لە سوپای بەریتانی هاتنەکار، ئەو دوو شارە وەك دوو باڵ وەهابوون بۆ شۆڕشەکەی برایم خان.

سوپای تورك کە بەیەکجاری لەخانەقی کشایەوە (خورشید بەگی دەلۆ) لەگەڵ (عەلی ئیحسان پاشا) تا موسڵ چوو لەگەڵیا بەرەو تورکیا کەوتەرێ لە زاخۆ دەنگوباسی تەواوبوونی شەری یەکەمی جیهانو هەرەسهێنانی دەوڵەتی عوسمانی بیستو بڕیاریدا لەوە زیاتر نەرواو نەبێتە پاشکۆی سوپا شکستەکەی تورك کتوپر دەست بەرداری تورك بوو هاتەوە موسڵ لەوێشەوە گەیشتە کەرکوك، سوپای بەریتانی لە کەرکوك گرتیانو دایان بەدادگای خۆیان بەو تۆمەتەی یارمەتیدانی سوپای تورکی داوە، لەبەر ئەوەی لەخۆیەوە گەراوەتەوە داوای ئەوەیان لێ کرد یان دە هەزار ڕوپیە سزا بدات.. یاخود بچێتە بەندیخانەوە، ئەویش لەوێوە پەیوەندی لەگەڵ هۆزەکەیدا کرد ئەوانیش لە ماوەی دە ڕۆژدا پارەکەیان بۆ کۆ کردەوەو ناردیانە کەرکوك کتوپر بەرەڵڵا کراو هاتەوە خانەقیو چووە (کانی ماسی)و لێیدانیشت لەناخی دڵییەوە بڕیاری دابوو کە تۆڵەی ئەو سزایە لە ئینگلیزەکان بکاتەوە.

لەو کاتەی برایم خانی دەلۆ بڕیاری رزگاری کردنی کفری دابوو پەیوەندی بە خورشید بەگەوە کرد[٨] تا ئەویش خانەقی لە چنگ داگیر کەر دەربهێنێت، ئەمیش پەیوەندی بەکەسانی ناو هۆزەکەیو تێکوشەرانی خانەقیو دەورووپشتیدا کردو هات شۆڕشێکی بەرپا کردو روویان کردە شاری خانەقی، کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە (کاپتن ماترسۆن)ی جێگری حاکمی سیاسی خۆیو ژنەکەیو دەستو دایەرەی شاریان بەجێهێشت شۆڕشگێرانیش ڕۆژی ١٤ی ئابی ساڵی (١٩٢٠) چوونە ناو شارەوەو بەیداخی بەریتانیایان هێنایە خوارەوەو ئەنجومەنێکیان بەسەرۆکایەتی (خورشید بەگ) داناو (مەحموود بەگو کەریم ساڵحو محەمەد ساڵحو محەمەد ئیسماعیل)و چەند کەسێکی تر تیادا بەشداریان کردو بڕیاریاندا پارەی عوسمانلی بکەوێتە رەواجەوە، ئەمنو ئاساییش بە جۆرێك لەناو شار بڵاوبووەوە خەڵکی تا بەیانی دەرگایان لەسەر گازی پشت کرابووەوەو هەرکەسێك بە چاوی تەماعەوە دەستدرێژی بکردایەتە سەر ماڵی هەر کەس سەد ڕۆپیە سزای ئەدرا، پوولێکی بدزرایە سەد پوول لە دزەکە ئەسەندرا، لەم راپەڕینە جگە لە دەلۆ هۆزی

سورەمێری و بەشێك لە کاکەیی و باجەلانیش بەشداریان کرد هەر لەوکاتەشدا شۆڕشگێڕانی ناوچە شاری (قزربات – سەعدیە)شیان ڕزگار کرد.

بەریتانیاییەکان بەشەمەندەفەر هێزێکیان ڕەوانەی سەر خانەقی کرد، شۆڕشگێڕان لە ئێستگەی (باوە پلاوی) بۆسەیان بۆ نابووەوە کە شەمەندەفەرە چەکدارەکە گەیشت لەملا ولەولا لێی ڕاپەڕین و دەستڕێژیان لێکردن (خورشید بەگ) خۆی سەرکردایەتی ئەم شەڕەی کردبوو، لە ئەنجامدا شۆڕشگێڕان سەرکەوتن و هەر ئازوقەو تفاقێك لەو شەمەندەفەرەدا بوو دەستیان کەوت دابەشیان کردە سەر شۆڕشگێڕان ئاگریان بەردایە شەمەندەفەرەکە، لەم شەڕەدا لە شۆڕشگێڕان (قادرو ڕەشید خان) شەهید کران و (محەمەد ئیسماعیل)یش[٩] بریندار بوو.

لە ڕۆژانی سەرکەوتندا چەند کەسێك لەوانەی بەکرێ گیراوی دوژمن بوون بەفروفێل یەکێك لە سەرکردەکانی شۆڕشیان کوشت ئەویش (کەریم خوسرەو) بوو هەروەها سوپای بەریتانی هۆزەکانی (قەلخانی و سەنجاوی)یان هاندایە سەر دەلۆ لەناکاو بەسێ سەد چەکدارەوە لە ئێرانەوە هاتنەوە سەر گوندی (کانی ماسی)و ئاگریان تێبەردا، سوارەی دەلۆ بەسەرۆکایەتی (عەبدوڵلا بەگ)ەوە بەرەنگاریان لێکردن و زەرەرو زیانێکی زۆریان لێدان تا ناچاری ئەویان کردن پاشەکشێی لێبکەن[١٠].

پاش ئەم کەین و بەین و شەڕو لاشەڕو پیلان ڕێکخستنانە ئینجا سوپای بەریتانیا بەهێزێکی گەورەوەو لەگەڵ ئەو هۆزانەی لە پاشکۆیدا بوون هێرشێکی توندو تیژیان بردە سەر شۆڕشگێڕان، بەرەنگاری کردنی ئەم سوپا گەورەیە بەگران ڕائەوەستا ناچار شۆڕشگێڕان لە خانەقی کشانەوەو سەدو بیست خێزانی ناو خانەقی کە هەندێکیان عەرەب و تورکمان بوون و سەر بە شۆڕش بوون شارەکەی خۆیان بەجێهێشت ئەمەش نیشانەی یەك بوون بۆ ڕەوشت بەرزی شۆڕشەکەیە[١١].

شۆڕشگێڕانی دەلۆ دە ڕۆژ لە خانەقی فەرمانڕەواییان کرد، پاش تێکشکانی شۆڕش هەروەها دەستە پاچە لێیدانەنیشتن چەند جارێکی تر لەگەڵ باجەلان و سورەمێری و کاکەییەکان قسەیان کرد بەیەك و دەستیان دایە شەڕی چەتەگەری دژی دوژمن جارێکیان ئەفسەرێکی بەریتانیاییان کوشت ناوی (ئیسترچو)بوو خۆی و چەند کەسێکی کە لەگەڵیابوون سەرەنجامی ئەمە ئینگلیزەکان حەمید عزیز کاکەیی و عەلی باجەلان و کابرایەکی دەلۆشیان لە سێدارەدا[١٢].

*** ڕزگارکردنی دووزخورماتوو[١٣]:-**

دووزخورماتوو یان (توز – دووز)ی ئەمڕۆیان مەرکەزی قەزایەکی سەر بەپارێزگای سەلاحەدینە. شاری دووز کەوتووەتە سەر ڕێگای ئۆتۆمبێلی نێوان بەغدادو کەرکوك بە (٧٥) کیلۆ مەترە لە باشووری کەرکوکە و بە (٤٥) کیلۆمەترێك ئەکەوێتە باکووری کفرییەوە.

لەبنچینەدا ناوی (دووز) ئاشوورییە لەو سەردەمەدا (خیرمتی) پێ وتراوەو بووەتە (خورمات)و ئینجا وشەی (دووز) کەوتووەتە پێشی و بووەتە (دووز خورماتوو). گەڕیدەکان لە یادداشتەکانیاندا ناویان هێناوە (منشی بەغدادی) دەربارەی دووز وتویەتی (لە کفرییەوە بۆ دووز حەوت فەرسەنگە لە کفرییەوە بەڕێ ئەکەوێ بە چۆمی – قوری چای، لەوێوە تێ دەپەڕێت، ئەم چۆمە هاوینان وشکە، هۆزی بەیات لەم ناوچەیە ئەژین، دوو هەزار ماڵێك ئەبن بە تورکی و کوردی و عەرەبی قسە ئەکەین بەشێکیان شیعەو هەندێکیان سوننی مەزهەبن[١٤]، ولاغی بەرزەی چاکیان هەیە، لە تەنیشت دووزەوە ڕووبارێك تێ دەپەڕێ لە بەهاراندا ئاوی زۆرە نزیك دووز نەوتی ڕەش و خوێ دەرئەهێنرێت هەر لەناو ئەو شاخانەدا خاکێکی سپی هەیە وەك گەچ وەهایە گۆگردیش لە شاخەکانیدا هەیە، لەسەر لوتکەی شاخەکەی دووز قەلایەك لە بەردو گەچ دروست کراوە چوار دەرگای هەیە، لە دووز میوەجات زۆرە وەك ترێ هەروەها دارەخورمایشی تیادایە، زۆربەی خەڵکەکەی دووز مەی خۆرن و دەنگ خۆش و تار لێدەریان تیادایە، لەناو شار بە کوردی و تورکی گفتوگۆ ئەکەن بیروباوەڕیان عەلی ئیلاهییە، ڕێزی کەسی ئاوارە ئەگرن، شارەکە هەزار ماڵێك ئەبێت و پۆستەخانەیەکی تیادایە[١٥].

کلۆدیۆس (ریچ)یش دەربارەی (دووز) نووسیویەتی ئەڵێت: (سەعات دوو و نیو لە ئاوڕێژەکە پەڕینەوە چەترەکەم کردەوە خۆم دایە پاڵ سێبەرەکەی، عەریفێکم ناردە شار تاوەکو سەراکەمان[١٦] بۆ ڕێکخبەن و لە گەیشتنمان ئاگاداریان بکات، ئەوەندی پێ نەچوو حاکمی شارو عومەر بەگی جێگری هەردووکیان هاتنە پێشوازیمان، عومەر بەگ شارەکەی لە باوکەوە بۆ مابووەوە بەشێوەی (تیمار)[١٧]ێك بەڕێوەی ئەبرد، لەگەڵ ولاغەکانمان بووین و چووینە ناو دووزەوە ڕێگاکەمان بەناو باخی پڕ دارخورماو پرتەقاڵ و لیمۆو هەنجیرو هەلوژە هەنارو زەیتون تێدەپەڕی و چوار دەوری دووزیش بەباخ دەورە درابوو، لەخانووە خۆشەکەی عومەر بەگ دابەزین، بەچاو خانووەکانی دەوروپشتی بەغدادا گەورەبوو، خانووەکانی ناوشار زۆربەیان لە گل دروست کرابوون، دانیشتووانی شار زۆربەیان ئیسماعیلی بوون، شەوی شەممە تەرزەیەکی زۆر باری و زەرەرو زیانێکی زۆری بەباخەکان گەیاند، دەنکە تەرزەکان درشت بوون، دووز کەوتووەتە دەستە چەپی ڕیزە شاخەکانی کفرییەوە، ئاوە سپی ڕیزە شاخەکان ئەبڕێت ئاوی پیا دێتە خوارەوە، لەسەر ڕێگەی بەرەو ناو شاخەکان بیرە نەوتێك و کانە خوێیەك هەیەو لەناو گردەکانی بەشی خوارەوەشی چاوگە نەوتێکی تریش هەیە.

ڕۆژی ٢٩ی نیسان لەخەو هەستامو چووم بۆ دیتنی شوێنەوارەکانی دەورووپشت چاوگە نەوتەکە کە کەوتووەتە سەر ڕێگەی ناو شاخە نزمەکانەوەو بە میلێك لە شارەوە دوورە لەبەرئەوەی کەوتووەتە ناوەندی ئاوڕێژی ڕووبارەکەوە، جاربەجار ئاوی ئەکەوێتە سەر بۆ ماوەیەك پەکی ئەخات، چاوگەکە پانزە پێ قوولەو دە پێی پڕ لەئاوەو نەوتە ڕەشەکە ئەکەوێتە سەر ئاوەکەو هەمیشە لە ژێرەوە بڵق ئەداتە سەرێ خەڵکەکە نەوتەکەی لەسەر وەرئەگرنو ئاوەکەی ئەرێژنە ناو جۆگەکەیەوە، لەوێشەوە دەچێتە ناو چەند حەوزێکی لاکێشەیی بچووکەوە کە لەناو بەردەڵانەکەدا هەڵکەنراون، لەناو ئەو حەوزانەدا ماوەیەك ئەمێنێتەوە تا تاڵاوی تیادا نامێنێتو دەبێتە خوێیەکی سپی دەنك وردی بریقەدار، دەسکەوتی ساڵانەی ئەم چاوگە نەوتو خوێیانە نزیکەی بیست هەزار قروشێك ئەبێتو دابەش ئەکرێتە سەر بنەماڵەی دەفتەردار[18]، نەوتەکە دانیشتووانی دووز بەکاریان ئەهێناو پارەکەشی بۆ کاروانسەرای شارەکە سەرف ئەکراو بەشێکیشی لێ دەدرایە قوتابخانە ئایینییەکەی ناو شار، لەو کانە نەوتە ڕۆژێ نزیکەی دوو جەرە نەوتی لێ دەرئەکرا هەر جەرە نەوتێکی شەش حۆققە ئەبوو.

سەرچاوەی نەوتەکە کەوتبووە قووڵایی ژێر بیرە نەوتەکەوە خەڵکەکە ساڵی جارێ بە هاوکاری یەککردن ناو بیرەکەیان پاك ئەکردەوە، لەو ئاهەنگەدا دەهۆڵو زوڕنا لێئەدرا پەز سەر ئەبراو خواردن بەسەر هەژاراندا دابەش ئەکرا تاوەکو بیرە نەوتەکە دەستکەوتی پتر بێت، دوور نییە ئەم ئاهەنگە نیشانەیەك بێت لەدێر زەمانەوە پشتاو پشت هاتبێتە خوارەوە، زۆربەی تەپۆڵکەکانی بەشی خواروو بارانا و کەندری کردبوون چەند کۆڵەکەیان لێ بەدەرکەوتبوو، لە سەرووی ئاورێژەکەوە کەلاوەی شوورەیەکی کۆنمان چاوپێکەوت ڕەنگە لە سەردەمی ساسانییەکانەوە مابێت، لەناو ئاورێژەکەدا چاڵێکی بچووك لەتوێ بەردێکی گەورەدا هەبوو نەوتی لێ دەرئەهێنرا لەسەر ئەو چاڵە چوخمێکی چوارگۆشەیەکی کۆنی بەبەرد دروستکراو هەبوو.

لەدووزخورماتوو کاروانسەرایەك هەیە هەشتا سواری لێ جێئەبێتەوە، پلەی گەرما پێش نیوەڕۆ (٦٤) پلەو سەعات دوانزدەیش بوو بە (٧٠)و سەعات سێی پاش نیوەڕۆ هاتە خوارەوە تا گەیشتە (٦٦) پلە، با بەتووندی لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە هەڵی ئەکرد، پاش نیوەڕۆ باران باری، سەرژمێری دووز ئەگەیشتە پێنج هەزار کەسێك[19].

جوغرافیای عوسمانی دەربارەی (دووز) نووسیویە دەڵێت: (لە کەرکوکەوە شانزدە سەعاتە ڕێ دوورە (٧٥٦) خانووی تیادایەو سەرژمێری (١٧٤٩) کەسێك دەبێت، سێ خانو ٩٦ دوکانو سێ قاوەخانەو ٣٥ باخو یەك قوتابخانەی منداڵانی تیادایە، دانیشتووانی بە کوردیو تورکیو عەرەبی قسە ئەکەن)[20].

هۆزی (داودە) لە ئاواییەکانی ڕۆژهەڵاتو باکووری دووزدا نیشتەجێن، هۆزی بەیاتیش لە ئاوییەکانی ڕۆژئاوای دووزدان، ئەم دوو هۆزە لەناو خۆیاندا هەمیشە ڕێکوپێك بوون، (ڕەفعەتی سمایل بەگی داودە) سەر بە شێخ مەحمودی بەرزنجی بوو لەگەڵ برایم خانی دەلۆیشدا قسەیان کردبووە یەك بۆ ئەوەی کار بکەنە سەر بەریتانیا شێخ مەحموود لەدیلی بەرەڵڵا بکرێت بڕیاریاندا لەیەك وەختدا هەردوولایان شۆڕشێك بەرپا بکەن. ڕەفعەت بەگ لە تۆماری بەریتانیاییەکاندا بەدوژمنی سەرەکی درابووە قەڵەم (ئەدمۆندس) ئەڵێت: (ڕەفعەت بەگ لەسەر حاڵێك ناوەستێ، ئامادەیە هەر جموجۆڵێکی ڕوخێنەر - مەبەستی لە شۆڕشگێڕییە - لە ئاسۆی ڕامیاری دژی ئێمە ڕووبدات پشتگیری بکات)[21]. ڕەفعەت داودی لەگەڵ فارس بەگی سەرۆك هۆزی بەیات ڕێککەوتنو هۆزی (سائح) ی عەرەبیش پشتگیری لێیان کرد، بەکوردو تورکمانو عەرەبەوە لە ٢٠ی ئابی (١٩٢٠)دا دووزیان لە چنگ سوپای بەریتانی دەرهێنا، ئاڵای بەریتانیایان هێنایە خوارەوەو بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری شارە ئازاد کراوەکە ئەنجومەنێکیان بەسەرۆکایەتی (ڕەفعەت بەگی داودە) دامەزراند نوێنەرانی هۆزە شۆڕشگێڕەکانو دانیشتووانی دووزی تیادابوون، ڕەواجیان بە سکەی عوسمانیدا، ئەمنو ئاسایش باڵی کێشایە سەر شارو دەورووپشتیدا، لەو ماوەیە هیچ شتێکی ناڕەوا لەناو شاردا ڕووی نەدا.

*** ڕزگارکردنی کفری:-**

لەو کاتەی شۆڕشگێڕان ناوچەی (خانەقی)و (دووز) یان[22] لە دوژمن پاك کردەوە، شۆڕشگێڕانی ناوچەی (کفری) یش کەوتنە خۆ ئامادە کردن لە پێشدا بۆ چاوبەستو سەر لەدوژمن شێواندن شۆڕشگێڕانی دەلۆ لەوانەی لە ئاواییەکانی ڕۆژئاوای کفری دائەنیشن دایان لە خەتی شەمەندەفەرو سەربازگەکەی بەریتانیا لە کنگربانو سەربازگەی کفری، دوژمن ناچار بوو لە شانزدەی ئابدا ئەم بەیاننامەیە بڵاو بکاتەوە (دووجار یاخی بووەکان هێرشیان بردە سەر قەرخانو تیادا سەرنەکەوتن، سەربازگەی (سەلاحییە - کفری) هێرشی یاخی بووەکانی بەرپەرچ دایەوە)[23].

جەماوەری کفری لە دەنگوباسی ڕزگار کردنی خانەقیو دووز لە چنگ ئینگلیزەکان گەلێك دڵشاد بوون، لەو کاتەش زۆڵمو زۆری سەلەمۆنو دەستو پەیوەندی لەناو شاردا پەرەی سەندبوو دانیشتووانی شار پەیوەندییان بە برایم خانەوە کرد تا لەدەست دوژمن شارەکە ڕزگار بکات[24]، برایم خانیش پەیوەندی بەسەرەك تیرەکانی (ڕۆغزاییو تەرخانییەوە)[25] کرد تا پشتگیری لێ بکەن ئەوانیش بەدەنگیەوە هاتنو چەند سوارەیەکیان بۆ ئەم شۆڕشە ئامادە کرد، هەر کە ئینگلیزەکان بە جموجۆڵی هۆزە شۆڕشگێڕەکان گەیشتن سەرۆك سەربازگەی بەریتانیا لە کنگربان داوای لە (سلمنت) کرد کە بارەگاکەی خۆی لە کفرییەوە بگوێزێتەوە ناو سەربازگەیان، (سلمنت) نەخۆی نە ئەوانەی لە ئاواییەکانی ڕۆژئاوای کفری دائەنیشن دایان لەخەتیو نە خێزانەکەی ئەو ئامۆژگاریەیان نەچوو بەعەقڵەوە سلمنت وای ئەزانی کە لەناو شاردا بمێنێتەوە زیاتر کار ئەکاتە سەر ئەوانەی سەر بە ئینگلیزنو ورەیان بەرنادەنو مانەوەشی لەناو شاردا ئەرکێکەو کەوتووەتە سەرشانی[26].

لەبەرە بەیانی ڕۆژی ٢٢ی ئابی ساڵی (١٩٢٠)دا برایم خان و هەڤاڵەکانی لە دیوی پشتەوە سەرکەوتنە سەر شاری کفری لەوێوە دەستیان کردە تەقە کردنە سەر مەرکەزی (دەرەك - پۆلیسخانە) کە کەوتبووە خوارەوەی چیاکەوە، ئەو تەقە کردنە نیشانەی هەڵگیرساندنی شۆڕش بوو، شریقەی گوللە شارەکەی لەخەو ڕاپەڕاند، ئافرەتان لەسەربانەوە هەلهەلەیان هەڵئەداو پیاوانیش لەناو کوچەی شاردا ئەگەڕان و چاوەڕێی سەعاتی ڕزگار کردن بوون، (سلمنت) زوو کەوتە خۆو ناردیە شوێن ئەم پیاوە ناودارانەی کفری (جەمیل بابان، بەهجەت بابان، سەید سلێمان ئاغا، محەمەد سەعید وەنداوی، عوسمان سەلیم وەنداوی، [27] عەبدولوەهاب تاڵەبانی وەکیلی قائمقام عەلی ئەفەندی)و کەوتە گفتوگۆ کردن لە گەڵیاندا، داوای لێکرد لە گەڵیا بچنە لای (برایم خان)و داوای لێبکەن دەست لەم کارە هەڵبگرێ و ئاسایشی شار تێکنەدات، (محەمەد سەعید وەنداوی)[28] ئامۆژگاری کردو داوای لێکرد هەنگاوی وەها نەهاوێژێت چونکە دەلۆ ئێستا لە حاڵەتی هەیەجاندایە، ئەم قسانە نەچوونە گوێی سلمنتەوە خۆی و جەمیل بابان و عوسمان سەلیم و عەبدولوەهاب تاڵەبانی و عەلی ئەفەندی سەرکەوتنە سەر باوە شاسوار، کە برایم خان چاوی پێ کەوتن فەرمانی تەقە وەساتاندنیداو بەخێرهاتنی لێکردن، (سلمنت) بە برایم خانی وت دەست لەم کارە هەڵگرێت بەرامبەر بەمە ئەیکاتە (قایمقامی کفری) برایم خان وەڵامی دایەوە کە ئیتر باوەری بەبەڵێنەکانی نەماوەو داوای لێکردن بێ خوێن ڕشتن لە کفری دەربچن، (جەمیل بابان)[29] بەبرایم خانی ووت ڕەنگە ئێوە ئێستا سەرکەوتن وەدەست بهێنن بەڵام لەئەنجامدا بەریتانییەکان ئەگەڕێنەوەو ژاری تووڕەییان بەسەر خەڵکدا ئەرژێنن، برایم خان کە بڕیاری شۆڕشی دابوو قسەی (سلمنت)و ئەو خەڵکە ساردی نەکردەوە، لەو کاتەدا (شێخ وەهابی تاڵەبانی)ش هەڵیداو تکای کرد کە دەست لە بزووتنەوەکە هەڵبگرن (ئەکبەر)ی برای برایم خان لەقسەکانی شێخ وەهاب هەڵچوو دەستی لێدایە چەك، برایم خان خۆری بەسەر ئەکبەری برای ئەویش دەستی لێ سارد بووەوە شێخ وەهابیش بێ دەنگ بوو بەرەو دوا کشایەوەو ملی ڕێی گرتە بەرو بەرەو خوار بووەوە، عوسمان ئەفەندیش بە شوێنیا ڕۆیشت کە (سلمنت)یش بگەڕێتەوە. برایم خان وتی: تۆ میوانی ئێمەی بەدیلی ئەمێنێتەوە تا سەرەنجامی ئەم ڕاپەرینەمان بۆ دەرئەکەوێت، (جەمیل بابان) تکای لە برایم خان کرد بەرەڵڵای بکەن سوودێکی نەبوو ناچار ئەوو عەلی ئەفەندیش بەرەو شار گەڕانەوە، شۆڕشگێڕان (سلمنت) یان نارده ئاوایی (برایم)و لەوێ وەك دیلێك هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەکرا، پاش ئەوە شۆڕشگێڕان ڕووی تفەنگیان لە مەرکەزی دەرەك کردەوەو بۆی چوونە پێشەوە، چەند سەعاتێك هێزی ناو ئەم مەرکەزە بەرەنگارییان کرد چاریان نەما چەند کەسێکیان خۆیان دا بەدەستەوە[30] بێگانەکانیان (هیندی و ئینگلیز) هەڵاتن و تێکەڵ بەو هێزە بوون کە لە سەراکەی حکومەتدا خۆیان قایم کردبوو، کەوتبووە ڕۆژئاوای شارەوە، شۆڕشگێڕان چوونە ناو شارەوە، دانیشتووانی شار پێشوازییان لێکردن و ئەمانیش لەناو شاردا بڵاوبوونەوەو هێزێکیان چووە سەر (سەرای حکومەت) کە هێشتا هێزێکی بەریتانی تیادا مابوو، شەڕ چەند سەعاتێك دەوامی کرد، کە تاریك داهات و تەقە کەم بووەوە لە بەریتانییەکان ئەوی پێی کرا هەڵات و ڕووی کردە سەربازگەکەیان لە کنگربان و چوار لاشەی کوژراویان لێ بەجێما[31] ڕۆژی دووەم تەرمەکانیان ڕەوانەی سەربازگەکەیان بۆ کردن، هاوسەری سلمنت یەکێك بوو لەوانەی لە پێشدا لەسەراکەوە بەرەو سەربازگەی کنگربان ڕۆیشتبوو، ڕۆژی ئازادی لە کفریدا هەڵات ئاڵای بەریتانیایان لەسەراکەوە هێنایە خوارەوەو فەرمانیدا سکەی عوسمانی بکەوێتە ڕەواج و ئەنجومەنێك بۆ بەڕێوەبردنی شار بەسەرۆکایەتی (برایم خان)[32] دامەزراو بریتی بوو لەم کەسانە (وەیسی بەگی دەلۆ)[33]، ئەکبەری برای برایم خان، حەمیدی ئەورەحمان کاریزی دەلۆیی، کاکەمند ئەمین دەروێشی دەلۆیی[34]، حاجی محەمەدی تەرخانی[35]، حەمە جانی ڕۆغزایی[36]، برایم خان (برایم وەستا محاو)ی[37]، بەنووسەری تایبەتی خۆی دانا، شۆڕشگێران هەرچی ئازووقەو چەك و جبەخانەیەکیان لەسەراکەدا دەستکەوتبوو دابەشیان کرد، فەرمانبەران هەرکەسەیان لەسەر وەزیفەی خۆیان دەوامیان کرد، دەڵاڵیش جاریدا نابێ هیچ کەس پەنجە بۆ ماڵی کەس لە دانیشتووانی شار درێژ بکات و هەر شۆڕشگێڕێکیش ئەگەر دەست درێژی کرد سزای ئەدرێتێ دەستە دەستە بۆ پیرۆزبایی هاتنە لای برایم خان و خۆشی و شادی و پشتگیری خۆیان دەربڕی.

*** برایم خان کێیە؟**

بەگشتی فەللاحی دەلۆیی بەخاوەن موڵکێکی بچووك[38] ئەژمێردرێ، پارچە زەوییەکی بچووکی بەدەستەوەیە خۆی ئەیکێڵێت و ئاگاداریی ئەکات و دەستکەوتەکەی کۆ ئەکاتەوە، ئەو زەوییانەی بەدەست جووتیارانی دەلۆوەیە ئەکرێتە چەند بەشێکەوەو بەشێکیان و ئەرازی ئەمیرییە ئەوە یەکسەر بەدەست جووتیاری دەلۆوەیە وەك زەوی دێیەکانی (کارێز، تەپەچەرموو، گلابات، عەین فارس) بەشێکیان بەتاپۆ هی بابانەکانە وەك (کنگربان)و بەشێکیان بەتاپۆ هی بەگزادەکانی جافە وەك (سەرقەڵا، سەی جەژنی وەلی هەیر، هەیەرە کەل)، بەڵام پشتاوپشت بەدەست جووتیاری دەلۆوە بووەو دەیەکی دەستکەوتیان داوەتە خاوەن ئەرزو هیچ ئەرکێکی تریان نەگرتۆتە ئەستۆ. برایم خان لە باب و باپیرەوە گەورەیی دەلۆکانی ڕۆژهەڵاتی شاری کفری بەدەستەوە بوو. برایم خان کوڕی ساڵح خان کوڕی ئەمین کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی ئەحمەد بەگە، ساڵی (١٨٧٤) لە ئاوایی (هەیدەرەکەل- حەیدەرەکەل) لەدایکبووە[39].

*** سەرجەلەی برایم خانی دەلۆ:**

لە تیرەی (خوبیاروەندی) هۆزی (دەلۆ)یە، برایم خان حەوت برای هەبووە بەپێی تەمەنیان ئەمانە بوون (کەمەرو محەمەدو کاکەو برایم و ئیبراهیم و حوسێن و ئەکبەرو کەریم و حەمە سالح) برایم خان لە منداڵییەوە لای مەلای ئاوایی فێری نووسین و خوێندن بووە عەرەبی و فارسی دەزانی، شیعری شاعیرانی وەك (مەولەوی، حەسەن کەنۆش، میرزا شەفیع، شێخ رەزا، خەلیل منەوەر)ی لەبەر کردبوو، پیاوێکی لەخوا ترس و دەست بە دەستنوێژ بوو هەمیشە ئایەتی قورئانی لەبەر بوو، بەدەستی خۆی کشتوکاڵی ئەکردو سواری ئەسپ ئەبوو ئەچووە راوو شکار، پیاوێکی کەڵەگەتی توکنی گەنم رەنگ بوو بەزەبرو زەنگ و هێزو توانا بوو، کەواو سەڵتەی لەبەر ئەکردو چەفتەی لەسەر ئەکرد، خەنجەرێکی دەبانی مشتو سپی بەپشتێنەوە بوو، رێزی لە هەموو کەسێك ئەناو دائیما میوانی لەدیوەخانەدا هەبوو، رۆحی شۆڕشگێری لە باوك و کەمەرخانی برا گەورەیەوە وەرگرتبوو (کەمەرخان) چەند ساڵێك دژی ستەمکاری عوسمانییەکان چەکی هەڵگرت هەر لەو پێناوەدا سەری دانا، برایم خان سوێندی خوارد تۆڵەی هەردوو برا شەهیدەکانی لە چەوسێنەر وەربگرێتەوە، برایم خان خاوەن خوو رەوشتێکی کۆمەڵایەتی بوو لە شین و شادیدا بەشداری هۆزەکەی ئەکرد پەیوەندی لەگەڵ بنەماڵەی بابان و بەگزادەکانی جافدا پتەو بوو، لەگەڵ سەیدەکانی کفری و وەنداوییەکاندا ئامشۆیان بەسەرییەکدا هەبوو، بەهۆی ژن و ژنخوازییەوە برایم خان لەگەڵ هەندێ لە تیرەکانی ناو جاف خزمایەتی کردبوو (بەور ئاغا)ی سەرۆکی گەلاڵی (خاڵ عاسی) خوشکی برایم خانی هێنا بوو (فەرەج ئەحمەد)ی سەرۆکی تەرخانیش خوشکێکی دیکەی برایم خانی هێنابوو (برایم خان) خۆیشی (ئامینەی کچی رۆستەم سەرحەد)ی رۆغزایی مارە کردبوو، (وەیسی بەگی) دەلۆیش کچێکی لە هۆزی (لهێب)ی عەرەب مارە کردبوو، زۆر کەس لە دەلۆییەکان لەگەڵ هۆزی گێژ، داودە، سەید، ژن و ژنخوازییان لە ئارادا بوو.

برایم خان چوار کوڕی هەبوو (عەزیز، شەرەف، جەعفەر، حەمید)[٤٠]، لەو چوار کوڕە شەرەفیان لێماوەتەوەو لەوانیشەوە کوڕو کوڕەزایان لێ بووەتەوە، (سمایلی کوڕی عەزیزی برایم خان) لەناو هۆزو خەڵکدا لە هەموویان دیارێترو لە ریزی پێشەوەیاندایە.

*** هەڵوێستی دوژمن پاش رزگارکردنی کفری**

سوپای بەریتانی لە رزگار کردنی شارەکانی (خانەقی) و (دوون)و (کفری) لەیەك هەفتەدا واقیان ورما ترسی ئەوەشیان نیشتە دڵ کە شۆڕش شارەکانی دیکە بگرێتەوە، بیریان لەوە کردەوە سەربازگەی (کنگربان) بەهێزتر بکەن، هاتن شەمەندەفەرێکی پڕ چەك و ئازووقەیان لە جەلەولاوە بۆ کنگربان بەرێ کرد، شۆڕشگێڕان ئاگایان لە جموجۆڵی دوژمن هەبوو، لەسەر پردو دووریانەکاندا یاساول و بۆسەیان بۆ داناو چوونە سەنگەرەوەو سکەی شەمەندەفەریان لای پردەکەی (فەککە) هەڵتەکاند، هەر کە شەمەندەفەرەکە لە دوورەوە دەرکەوت دەستیان خستە سەر پەلەپیتکەی تفەنگەکانیانەوە کە شەمەندەفەر لای سکە هەڵوەشاوەکە وەستا لە هەموولایەکەوە دەستڕێژیان لێکردو رێی گەرانەوەیان لێ بری، دوژمنانیش کەوتنە تەقەکردن، شەر چەند سەعاتێکی خایاند شۆڕشگێڕان سەرکەوتن و هەرچی ئازووقەو تفەنگ و نارنجۆك و سنوقە فیشەك هەبوو کەوتە دەست شۆڕشگێڕان و پاش ئەوە ئاگریان لە شەمەندەفەرەکە بەردا، لەم شەڕەدا جوتیارە دەلۆییەکانی ئاوایی (فەککە، عەین، شکور، گلابات) بەشداریان کردو تاقمێك لە شۆڕشگێڕانی عەرەبی لهێب بەسەرکردایەتی (ئەحمەد ئەلموللا) تیادا بوون لەم شەڕەدا (حەمید مەجید دەلۆیی) شەهید کرا.

دەنگوباسی رزگار کردنی شاری کفری و گرتنی ئەم شەمەندەفەرە لەناو جەماوەردا بڵاوبووەوە، ئیتر داگیرکەران نەیانتوانی لەمە زیاتر ئەم راستییە لە خەڵك بشارنەوە، پاش هەفتەیەك ناچار ئەم بەیاننامەیان بڵاوکردەوە (هۆزەکانی لیوای کەرکوك هەروا کپ و بێ دەنگ نەوەستاون، هێرشیان هێنایە سەر کفری و جێگری حاکمی سیاسیان بەدیل گرت، هێزەکانمان کە پارێزگاری خەتی شەمەندەفەری نێوان کفری و دیالەی پێ سپێردراوە ساغ و سەلامەتن، دەنگوباسی وامان بۆ هاتووە کە یاخی بووەکان هێرشیان بردووەتە سەر هەندێ لە سەربازگەکانمان و تووشی زەرەرو زیانێکی زۆر بوون[٤١].

*** گفتوگۆی نێوان هەردوولا:**

ئینگلیزەکان بۆیان دەرکەوت بەزۆری کوتەك ئیشیان بۆ ناچێتە سەر داوای گفتوگۆ کردنیان لەگەڵ شۆڕشگێڕان کرد تاوەکو بتوانن بە بەڵێن و قسەی چەور بیبەنەوە، برایم خان نەرم و نیانی پیشاندا تاوەکو بتوانێت بێ خوێن رشتن بگاتە ئەنجامی شۆڕش، شۆڕشگێڕان بۆ گفتوگۆ کردنەکە (محەمەد سەعید وەنداوی) یان هەڵبژارد، بەریتانییەکانیش سەرۆکی (شەبانە) (موراد موبارەك)یان هەڵبژارد، هەردوو نوێنەر یەکیان گرت و دەستیان کردە گفتوگۆ کردن، ئینگلیزەکان ئامادەییان پیشاندا ئەگەر برایم خان جێگری حاکمی سیاسی (سلمنت) بەرەڵلا بکات پەنجا هەزار روپییەی ئەدرێتی و ئەکرێتە قایمقامی کفری (محەمەد سەعید وەنداوی) گەرایەوە لای برایم خان و ئەویش ئەم خاڵانەی بۆ دەستنیشان کرد.

١- ئەبێت شێخ مەحمودی حەفید لە دیلی بەرەڵلا بکرێت و بگەرێتەوە سلێمانی.

٢- پاش گەرانەوەی شێخ ئەوسا سلمنت بەرەڵلا ئەکرێت.

٣- ئەگەر ئەو دوو مەرجە پێکهێنرا برایم خان پەنجا هەزار روپیە ئەداتە ئینگلیزو پلەی قایمقامیش رەت ئەکاتەوە.

کاتێك (موراد موبارەك) مەرجەکانی برایم خانی بە ئینگلیزەکان گەیاند دەماریان گرژ بوو چاویان پەریە تەوقی سەریان و بۆیان ئاشکرا بوو کە پەیوەندییەکی تەواو لەنێوان شێخ مەحمودو برایم خاندا هەبووە، گفتوگۆ لە یەکەم پلەدا

پچڕاو سوودی هەر ئەوەبوو کە هەردوولا زیاتر لەیەکتر ئاشکرا بوون.

* هێرشێکی تێکشکاو:

ئینگلیزەکان لەوە دڵنیا بوون کە برایم خان بەبەڵێنی چەوریان هەڵ ناخەڵەتێت دەستیان دایەوە هەڕەشە کردن ناکاو بە هێزێکی گەورەوە لە سێ لاوە پەلاماری کفریاندا، بۆ ئەم مەبەستە (دگلس)ی جێگری (سلمنت) لەگەڵ (شێخ وەهابی تاڵەبانی)و (عەبدولکەریم وادی ئاغای زەنگەنە) لە ئاوایی (زەرداو)[٤٢].

کۆبوونەوەیەکیان پێکهێنا، بەزۆری‌و زۆرداری لە هۆزەکانی (زەنگەنەو گێژو پالانی) هێزێکی گەورەیان دروست کردو شان بە شان هێزێکی پڕ چەکی بەریتانی لە بەرەبەیانی ڕۆژی (٣٠ی ئابی ١٩٢٠)دا لەسێ لاوە پەلاماری شاری کفریانداو لەسەر ئەو چیایەی لە ڕۆژهەڵاتەوە ئەڕوانێتە کفری مەتریلۆزێکیان[٤٣] دامەزراند، لە یەك سەعاتدا دەستیان کردە تەقەو دەستڕێژ کردن، شۆڕشگێڕان لە جموجۆڵی دوژمنان بێ خەبەر نەبوون، لە چوار دەوری شار خۆیان لە سەنگەردا قایم کردبوو، تا خۆر بەرز بووەوە شەڕ گەرمتر ئەبوو، دوژمنان کردیان‌و کۆشان نەیان توانی کەلەبەرێك بخەنە ریزی شۆڕشگێڕانەوە، شۆڕشگێڕان ئاخێزیان بەرەو پێشەوەدا، بەڵام مەتریلۆزەکە لوولەی دەمی لێکردبوون، بڕیاریاندا هەرچوونێك بێت ئەبێ مەتریلۆزەکە بگرن، سێ کەسی ئازایان (محەمەد عەلی بارام‌و بارام بەگی دەلۆیی‌و ئەحمەد ئەسعەد تەرخانی) ناو خوایان لێهێناو چەکیان لێهەڵکردو بەئاسپایی کەوتنە پشت کابرای سەر مەتریلۆزو تا لای کردەوە هەرسێکیان گەیشتبوونە سەری‌و دایانە بەر خەنجەرو بەدەنگی (الله اکبر) ئەم سەرکەوتنەیان بەشار گەیاند، یەکێك لە دانیشتووانی کفری (سید محەمەد چایچی) چووە سەر مەتریلۆزەکەوەو ڕووی دەمی ئاراستەی سوپای دوژمن کرد، لەم لاشەوە شۆڕشگێڕان بە پیادەو بەسوارە هێرشیان بردە سەر دوژمن، سوپا زۆرو بۆرەکەی بێگانە بەجارێ هەرەسی هێناو پیاوی ئازایان ئەویان بوو کە سەری خۆی لەم داوە ڕزگار بکات‌و پاشەکشێی بۆ بکات، لەم شەڕەدا نزیکەی سەد سەربازی بەریتانی کوژران بیست‌و پێنجیان لە هیندییەکان[٤٤]. بوون‌و شانزدە ئۆتۆمبێلی لۆری عەسکەری تێکشکاو ئاگری تێبەردراو دەستکەوتیش دوو مەتریلۆزو چەند سنوقە فیشەکێك‌و دەیەها تفەنگ‌و دەمانچە بوو، لە شۆڕشگێڕانیش حەوت کەس شەهید بوون یەکێکیان (حەمیدی ئەورەحمان کارێزی) بوو کە یەکێك بوو لە دەمراستی دەلۆو ئەندامی ئەنجومەنی ئەو شۆڕشە بوو.

* (کوشتنی سلمنت):

شەهید بوونی حەمیدی کوێخا ئەورەحمان‌و ئەو شەش کەسە دڵی شۆڕشگێڕانی غەمبار کرد، لەناو خەڵکدا بەهەڵە دەنگوباسێ بڵاوبووەوە گوایە (برایم خان) خۆی کوژراوە ئەم دەنگوباسە گەیشتە (ڕەشید محەمەد سنجان)کە پارێزگاری (سلمنت)ی پێ سپێرابوو ئەمیش دەستی دایە تفەنگ‌و ڕووی لوولەکەی کردە (سلمنت) تەقە لە تفەنگ دەرچوو سلمنت لە خوێنی خۆی گەوزایەوە. کاتێك برایم خان ئەم دەنگوباسەی پێگەیشت لە ڕەشید تورە بوو لای خۆی دەری کرد چونکە دیل کوشتن کارێکی نارەوایە، بەڵام تازە کار لەکار ترازاو ئەوی پیاوی نەزان ئەیکات بەسەد زانا بۆی پینە ناکرێت‌و ڕەشیدیش بۆ خۆی تا مرد بە (ڕەشەی حاکم کوژ) ناوبانگی دەرکرد.

ئینگلیزەکان لە شکستی هێزەکەیان‌و پووچ بوونی هێرشەکەیان‌و کوشتنی سلمنت جێگری حاکمیان یەجگار پەست‌و تووڕە بوون‌و بڕیاریاندا بەهەر شێوەیەك بێت تۆڵە لە شۆڕشگێڕان بکەنەوە.

شێخ وەهاب تاڵەبانیش پاش شکست هێنانی هێرشەکەیان چووە ناو گڵ‌و ئەم دەنگوباسانەی بە شێخ حەمیدی باوکی گەیاند، ئەوانیش چوونە لای (لۆنگریك)ی فەرماندەی بەریتانی لە کەرکوك لەوێ کۆبوونەوەیەکی گرنگ گیراو بڕیاری ئەوە درا ڕیزیان ڕێکبەخەنەوەو بەسوپایەکی گەورەوە بچنە سەر شۆڕشگێڕانی دووزو کفری، پێش ئەوەی بچێتە کۆڕی شەڕێکی دیکەوە با لەنزیکەوە شێخ حەمیدی تاڵەبانی بناسین.

* شێخ حەمید کێیە؟

لەمەوپێش ئەومان دەربڕی کە بنەماڵەی تاڵەبانی لە سەرچاوەدا ئەچنەوە سەر (مەلا مەحمودی زەنگەنە) کە لە ئاوایی (تاڵەبانی)سەر بە قەزای چەمچەماڵ دانیشتوبوو، پاش خۆی نەوەو وەچەی زۆری لێبووەتەو هەر تاقمێکیان بۆ ئیرشاد کردن لەسەر پەیرەوەی (قادری) ڕوویان کردووەتە ناوچەیەك، هاتوون لە سەرەتادا تەکیەیەکیان داناوەو ئیرشادی خەڵکیان کردووە ئینجا دەستیان داوەتە موڵك‌و ماڵ پێکەوەنان، لەو ناوچانەی کەتیادا بڵاوبوونەتەوە (کەرکوك، کۆیە، کفری، خانەقی، داقوق، بناری گل).

شێخ عەزیزی تاڵەبانی کە پیاوێکی خواناس بوو چووەتە بناری گل لەوێ تەکیەیەکیان بۆ دروست کردووەو دەستی داوەتە بڵاوکردنەوەی پەیرەوی (قادری) لە ماوەیەکی کەمدا جوتیارێکی زۆری لەدەور کۆبوونەتەوەو بوونەتە دەروێشی شێخ، پاش مردنی خۆی (شێخ حەمید)ی کوڕی لە سەرەتادا لەسەر هەمان ڕێڕەو ڕۆیشتووە تا جێی باوکی پڕ کردووەتەوە، هەر لە منداڵییەوە نیشانەی زیرەکی تیادا وەدەرکەوتووە بە ئازایەتی‌و چالاکی خۆی لەماوەیەکی کەمدا بووەتە یەکە پیاوی ناو تاڵەبانی‌و تا (شێخ ڕەزا)یش بەم جۆرە شانازی پێوەکردووەو ئەڵێت:-

حەیدەری کەڕراوە یاخود خالیدی ئیبنی وەلید:

ڕۆستەمێکە ڕۆژی دەعوا بەینی بەینەڵڵا حەمید

شێخ حەمید لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە دەسەڵاتی دەرکردنی نەوتی بناری گلی پێدرابوو ئەمەش دەسەڵاتی زیاتر پێکرد، لەلایەکی تریشەوە دوو بەرەکی خستە ناو جووتیارەکانی ئەو ناوچەیەوەو لەسەرەنجامدا بەرەی لەژێر پێی هەموویان ڕاکێشا ئەڵێن: پیاوێکی دڵرەقی درندە ڕەوشت بووە، دۆستو دوژمنی لانەبووە، دوژمنی دوێنێی دۆستی ئەمڕۆو دۆستی دوێنێیش دوژمنی ئەمڕۆی بووە، لەبەر بەرژەوەندی خۆیو کەسو کارەکەی بەولاوە هیچی تری مەبەست نەبووە، ڕووی بکردایەتە هەر گوندێك تێكو مەکانی ئەدا، ئەم دەرەبەگە هێزەکانی خۆی بۆ یارمەتیدانی ئینگلیزو دژ بەبرایم خان کۆکردەوە تا تۆڵەی شێخ وەهابی کوڕی لێ بکاتەوە[٤٥].

هەموو سەرچاوەکان ئەوەیان دووپات کردووەتەوە کە شێخ حەمید پێش ئەوەی سوپای بەریتانیا ناوچەکە داگیر بکات بەنهێنی پەیوەندی لەگەڵ بەریتانیادا هەبووەو خۆیو خزمەکانی دەورووپشتی کفری زۆربەیان هەر سەر بە ئینگلیزەکان بوونو[٤٦]. شێخ حەمید هەر بەڵێنێکی بە ئینگلیزەکان دابێت بەتەواوەتی جێ بە جێی کردووە[٤٧].

سەرەڕای ئەم هەموو خزمەتانەش ئینگلیزەکان شێخ حەمیدیان بە پیاوێکی فێڵباز دابووە قەڵەم[٤٨].

هەرچی چۆنێك بێت ئەو خو و ڕەوشتەی بوو بەهۆی ئەوەی زەویو زارێکی زۆر داگیر بکاتو کەس نەتوانێت بەرامبەری بوەستێت، نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت کە شێخ حەمید گەیشتبێتە تینی هەڵوێستی پیاوانەی هەبووە ئەویشمان لە لاپەڕەکانی داهاتوودا بۆت دەرئەکەوێت.

وەنەبێت سەرجەمی بنەماڵەی تاڵەبانی هەر سەربەبێگانەکان بووبێتن، بەڵکو چەند بەرەبابێکیان دژایەتیان لەگەڵ شێخ حەمیدو ئینگلیزەکاندا کردووەو یەکێك لەوانە: (شێخ قادری سیامەنسوور)[٤٩]، بووە کە لەناوچەکەیدا وەکو درکێك بووە بەرەبەرەکانی لەگەڵ بەریتانییەکانو بەکرێ گیراوەکانیدا کردووە، ئەم هەڵوێستەی شێخ قادر مەترسی خستە دڵ شێخ حەمیدو تاقمێك لە خزمەکانی بۆ چارەسەر کردنی ئەم گیروگرفتە هاتن ڕاپۆرتێکیان بۆ حاکمی سیاسی بەریتانی لە کەرکوك بەرز کردەوەو دڵسۆزی خۆیان تیادا نواندو ئامادەییان پیشاندا بۆ سزادانی ئەو پێنج ئاواییەی لەیلان بەقسەی ئەوان کە کاریان کردووەتە سەر ناوبانگی تاڵەبانییەکان لای حکومەتی بەریتانی[٥٠].

### * هێرشە خوێناوییەکەی سوپای بەریتانی:

(لۆنگریك) حاکمی سیاسی بەریتانی لە کەرکوك[٥١] کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ شێخ حەمیدو لایەنگرەکانی تریاندا کرد لەو کۆبوونەوەیە بڕیاردرا بە لوولەی تفەنگو بەخوێن ڕشتن ئەبێت زاڵ ببنە سەر شۆڕشەکانی ناوچەی (لەیلانو دووزو کفری) بۆ ئەم مەبەستە سوپایەکی گەورەیان ئامادە کردو دەوری شێخ حەمیدیش ئەوەبوو لەناوچەی گلەوە سێ سەد سوارەی خۆی ئامادە بکاتو لەڕێگا تێکەڵاوی هێزەکانیان ببێت.

سوپای بەریتانی لە کەرکوکەوە بەسەرکردایەتی (مێجەر مۆلوی) بەڕێی لەیلانو قەرەحەسەندا بەرەو (دووزخورماتوو) کەوتەڕێ، ئەم سوپایە تۆپی گەورەو مەتریلۆزو چەکی نوێو ئازوقەی زۆری هەبوو، هەر کە سوپاکە بەم هەموو قورسایییەوە گەیشتە ناوچەی (قەرەحەسەن) هێزەکانی شێخ قادریان لێ ڕاپەڕیو کەوتنە دەسترێژی کردنی دوژمنو ماوەیان نەدا بەرەو پێشەوە برۆن، دوژمن ناچارما فرۆکەیان لێ بخاتە کارو بۆمبارانی ئەو هێزە کەمەو دێهاتەکانی شێخ قادریان کرد، ئەویش خۆیو چەند کەسێك لە هێزەکەی دایان بە چیا نزمەکانی ئەو ناوچەیەدا ڕێگا بۆ دوژمن تەخت کرایەوەو کەوتنە ڕێ لە دوو ڕێیانەکەی نێوان (تاوغ – دووز) شێخ حەمیدو سێ سەد سوارەکەی تێکەڵاو سوپای بەریتانیا بوون، جگە لەوەی هێزێکی شەبانە بەسەرکردەی (موراد موبارەك) دەست نێژی دوژمنو لە پاشکۆیدا بوون، بۆ ڕۆژی دووەم ئەم هێزە گەیشتنە دەورووبەری شاری دووزو لە چوار دەوری شار هەڵیانداو ئینزارێکی بەهێزیاندا بە شۆڕشگێڕان (ئەگەر کتوپڕ لەشار نەکشێنەوە ئەوا سوپای بەریتانیایان ئەچێتە سەر)، شۆڕشگێڕان چوونە ناو سەنگەرەکانیانەوەو بڕیاری بەرگری کردنیاندا، سوپای بەریتانیاو سوارەکانی شێخ حەمیدو هێزی شەبانە لە هەمولایەکەوە هێرشیان بردە سەر شۆڕگێڕانو شەڕێکی قورسی خوێناوی لەو ڕۆژەدا ڕوویدا خوێنی شەهیدانی کوردو تورکمانو عەرەب لەناو کوچەو کۆڵانەکانی ناوشاردا تێکەڵ بەیەکتر بوو، تۆپو شەستی تیری دوژمنو تەیارەش لەسەرەوە ئاراستەی سینگی شۆڕشگێڕان کرا تا ئێوارێ شەڕ هەر گەرم بوو، گولله هاتە نەمان، (ڕەفعەتی سمایل بەگ) خۆیو چەند کەسێك لەزەردە پەڕدا خۆیان دەرباز کردو دایان بەچیاکانی ڕۆژهەڵاتی دووزداو دوژمنیش لەسەر لاشەی (٤٤)[٥٢] شەهید هەموو دووزی گرتەدەست، هەر لەو ڕۆژەدا دوژمن بەتەیارە بۆمبارانی دێهاتەکانی (ئەلبو سەباحو سلێمان بەگو خاصە دەرلو)ی کردو ئاگری تێبەردان، سوپای دوژمن لەناو شاردا بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە داوای لە هۆزی (داودە) کرد (٣٥) هەزار ڕوپییە[٥٣].بەبارمتە بداتە ئینگلیز لەگەڵ (١٣٠) تفەنگو هۆزی بەیاتیش دە هەزار ڕوپیە پارەو دووسەد تفەنگو دانیشتووانی شاری دووزیش ئەبێت (١٧) هەزار ڕوپیەو (٥٠٠) تفەنگ ببژێرن بە پێی بەیاننامەکە ئەگەر تا ٢٠ی تشرینی دووەم (واتە تا نزیکەی مانگێك) ئەم پارەو تفەنگانە تەسلیم نەکرا ئەوا سزای سەربازی قورستریان ئەخرێتە سەر[٥٤].

پاش گرتنی دووز سوپای بەریتانیاوهێزی بەکرێ گیراوان بەرەو جەرگەی شۆڕش (شاری کفری) کەوتنەڕێ، لەپێشدا گەیشتنە سەربازگەی بەریتانیا لە کنگربان پاش وچاندانێك کاربەدەستانی بەریتانیو شێخ وەهابی تاڵەبانی، عەبدولکەریم ئاغای زەنگەنە، موراد موبارەك، جەمیل بابان لە هێزەکە بوون) بەریتانییەکان بڕیاریان وابوو ئەو ڕێڕەوەی لە دووز گرتبوویانە بەر لێرەش بەکاری بهێنن لە تۆڵەی کوشتنی سلمنت هەمانەی قینو قاریان بڕژێننە سەر شۆڕشگێڕانی کفری، جەمیل بابان ئەمەی بەدڵ نەبوو

پێشنیازی کرد پەیوەندی لەگەڵ برایم خاندا بکرێ بەڵکو بێ خوێن ڕشتن لە شار بکشێنەوە هەروەها پەیوەندی لەگەڵ ناودارەکانی شاری کفریدا بکرێت بەڵکو کار بکەنە سەر برایم خان، هەرچەندە هەندێ لە دانیشتووانی ئەو کۆڕە ئەمەیان بەدڵ نەبوو بەلاَم (مۆلوی) پشتگیریی پێشنیازەکەی جەمیل بەگی کرد ئەمیش هات کاغەزێکی بۆ برایم خان نووسی لە پیلانە بۆگەنەکەی دوژمن ئاگاداری کردو داوای لێکرد لە شار بکشێتەوە هەروەها چەند کاغەزێکی بۆ سەیدەکانی کفری نووسی ئەوانیش چوونە لای برایم خان و داوایان لێکرد کە با کارەساتەکەی دووز لێرەش دووپات نەبێتەوە.

شۆڕشگێران لەچوار دەوری شار سەنگەریان هەڵکەندبوو بڕیاری بەرەنگار کردنیاندا بوو، لەسەر ئەوە سوور بوون کە بچنەوە جەنگێکی خوێناوی لەگەڵ دوژمناندا بەلاَم کە زانیان دانیشتووانی شار ئامادەی بەرەنگاری کردنیان نەماوە، شۆڕشگێران لەناو خۆیاندا کۆبوونەوە بڕیاری خۆکشانەوەیاندا و داوای مۆڵەتی چەند سەعاتێکیان کرد بەهۆی جەمیل بەگی بابانەوە وەلاَم گەیشتەوە بەریتانییەکان، پێش ئەوەی ئەو مۆڵەتە بەسەربچێت هێزەکانیان بەرەو کفری خستەرێ لەناوەڕاستی ڕێگەی (کنگربان - کفری) لەسەر گردی (حەمە ئاغا) تۆپیان دامەزراندو چەند تۆپێکیان نا بەشارەوە بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە بترسێنن و برایم خانیش زووتر شار بەجێبهێڵێت، شۆڕشگێران تیپ تیپ کەوتنە ناو شارو خواحافیزیان لە خەڵکەکە کرد بە ئاسپایی شاریان چۆڵ کرد، برایم خان خۆی و چەند سوارێکی دواکەسێك بوون کە بەدڵ پەستی و قورگ پڕ لە گریانەوە لەشار دەرچوون، دانیشتووانیش لەوان دڵگیر تر بوون.

*** چۆنییەتی کشانەوەی شۆڕشگێران:**

بۆ چۆنییەتی کشانەوە، شۆڕشگێران بڕیاریاندا ببنە دوو بەشەوە بەشێکیان بریتی بوون لە چل پەنجا سوارێ چەك بەدەست بەسەرۆکایەتی برایم خان دایان بەکەژەکانی ڕۆژهەلاَتی کفری و بڕیاریاندا لە گوندەکانی خۆیان و لە چیا و هەردەکانی تەرخانی و ڕۆغزایی خۆیان قایم بکەن و لەوێوە لە کاتی گونجاودا شەڕی چەتەگەری دژی دوژمن بەرپا بکەن.

بەشی دووەمیان (بەشە زۆرەکەیان بوو) بەسەرۆکایەتی وەیسی بەگی دەلۆ ڕوویان کردە ناو گێژەکان لەوێوە چوونە ناو لهێب لەوێشەوە لە هەردەو چیاکانی حەمرین لە تەنیشت هۆزی عەززەی عەرەب نیشتەجێ بوون.

هەردوو بەشەکەیان بڕیاریاندا کە پەیوەندییان لەناودا هەبێت و هیچ لایەکیان بێ ئەولاکەی تریان نەکەوێتە هیچ بڕیارێکی چارەنووس و لەکاتی نارەحەتیدا ببێتە پشت و پەنای ئەویتریان، پێش ئەوەی (کفری) بەجێبهێڵن باوەشیان کرد بەیەکداو خوا حافیزیان لەیەك کردو هەردوولایان بەدڵ شکستیەوە شاریان بەجێهێشت.

وەیسی بەگ خۆی و زۆربەی دانیشتووانی دێهاتەکانی دەلۆی ڕۆژئاوای کفری بە خۆیان و سووکە ماڵێکیان بەسواری و لاَغەکانیان گەیشتنە ئاوایی (نارێن)ی مەڵبەندی هۆزی گێژ، سەرەڕای پەیوەندی ژن و ژن خوازی نێوان ئەم دوو هۆزە، گێژەکان لە ترس دوژمناندا نەیانتوانی شەوێك داڵدەی ئەم شۆڕشگێرانە بدەن، ناچار کەوتنە ڕێ تا گەیشتنە ئاوایی (عەین فارس) کە موڵکی وەیسی بەگ بوو، لەوێشەوە لە گردەکانی پەڕینەوە تا ڕۆژی دووەم گەیشتنە ناو هۆزی (لهێب)ی عەرەب کە لە شۆڕشدا هاودەنگی دەلۆ بوون، ژن و پیاوی هۆزەکە هاتنە بەرەو پیریان و تا چەند ڕۆژێك لەناویاندا حەسانەوە ئینجا ڕوویان کردە دۆڵ و تەپۆڵکەکانی چیای حەمرین هەر خێزانێك لە پاڵ سێبەری کەندەلاَن و شاخێکدا باری خست و خێوەتی خۆیان تیاهەڵدا، وەیسی بەگ خۆی و چەند سوارێك چوونە لای سەرۆکی شۆڕشگێرانی هۆزی عەززە[٥٥] وەك (عەلی لەتیف و حەبیب خەیزەران) ئەوانیش ڕێزیان گرتن و سێ ڕۆژ خزمەتیان کردن و گەڕانەوەو دەستیان دایە خشت بڕین و کوخت و خانوو دروست کردن تا لە سەرماو بارانی زستان خۆیان تیادا بپارێزن و هەر خێزانێکیش بۆ خۆی بەپێی توانا شینایەکی بەرهەم هێنا.

ئینگلیزەکان لە کشانەوەی دەلۆ ئاگاداریان هەبوو دەنگیان نەکرد تا یەك دوو هەفتەی بەسەردا تێپەڕی ئینجا ئەم بەیاننامەیان بلاَوکردەوە (هۆزی دەلۆ بەسەرۆکایەتی برایم خان توانیان بگەنە ناو هۆزی عەززەو لەوێ خۆیان شاردەوە)[٥٦].

لەلایەکی ترەوە دوژمنان پیلانیان بۆ ئەوە دانا کە هێزەکەی برایم خان ئابلوقە بدەن و لەناویان بەرن.

*** چۆن دوژمن چووە ناو کفرییەوە؟**

ڕۆژی دەی ئەیلولی (١٩٢٠)[٥٧] لە مێژووی شاری کفریدا بەڕۆژێکی ڕەش ئەدرێتە قەڵەم، لەو ڕۆژەدا دوکانەکان کلیل دران، بازار داخرا، هەر کەسێك چووە ناو ماڵی خۆی و خر دەرگای لەسەر خۆی کلیلدا، لە سەربان و درزی دەرگاوە ئەیان ڕوانی تا بزانن ئاخۆ دوژمن چی پیلانێکی بۆ شارە شۆڕشگێڕەکەیان داناوە؟

شێخ حەمیدی تاڵەبانی یەکەم کەسێك بوو کە چەفتەو عەگالی لەسەرنابوو هاتە ناو شارەوە دوابەدوای ئەو شێخ وەهابی کوڕی و عەبدولکەریم ئاغاو سوارەو هێزەکانیان ڕژانە ناوشار (مراد موبارەك) خۆی و شەبانەکەی تاویان دایە شار، پاش ئەوە مێجەر (مۆلوی) کەوتبووە پێش سوپاکەیانەوە کە بریتی بوون لە سۆجەرو هیندی وسیك و گورگە، پاش ئەوەی ئەم هێزە سوڕێکی ناو شاریان خواردو خۆیان نواند سەرۆکەکانیان چوونە سەرای حکومەت، ئاڵای بەریتانیایان لەسەر سەرا هەڵکردەوەو سێ جار بۆ ژیانی مەلیك جۆرج هاواریان کرد تێر چەپڵەیان بۆ خۆیان لێداو هەر ئەو ڕۆژە کورسی و پایەیان لەناو خۆیاندا بە ئەمری ساحیب بەم جۆرە دابەش کرد: شێخ حەمید بەشێوەیەکی موەققەت نیشتە سەر کورسی سەر کورسی قایمقامی، شێخ وەهابیش بوو بە سەرۆکی دەرەك، عەبدولکەریمی وادی ئاغایش کرا بە مودیر ناحیەی زەنگەنە[٥٨].

کاربەدەستانی نوێ و مێجەر (مۆلوی) کۆبوونەوەیەکیان کردو بۆ زەبرو زۆر نواندن و تۆڵە سەندنەوە لە شۆڕشگێران و لایەنگرانیان ئەم بڕیارانەیاندا:

١- گرتنی محەمەد سەعید وەنداویو محەمەدی حاجی نوعمانو بەهجەت بابان[٥٩] چونكە سەر بەشۆڕش بوون.
٢- ئەموالی مەنقولەو غەیر مەنقولەی هەندێ لە دەلۆییەكانی ناو شاری كفری حیجز كرا وەك (شەفیق خدر ئەفەندیو برایم وەلی بەگو محەمەد ئەمین غەنچەو سلێمان زلفەو نەعیمە مستەفا - نەعەنێر) هەروەها حیجز خرایە سەر خانوو ماڵی برایمی وەستا محاو[٦٠].
٣- دەست خرایە سەر هەرچی زەویو زارێكی ئاواییەكانی دەلۆ هەیەو هەندێكیان لەموزایەدەدا فرۆشرا ئاوایی عەین شكوری گلابات لەم موزایەدە كردنەدا كەوتە دەست سەید عومەر ئاغا.

كاربەدەستانی بەریتانی لە چەند هەفتەی ئەوەڵی چوونە ناو شاردا زۆر بەتووندو تیژی هەڵسوكەوتیان لەگەڵ خەڵكدا ئەكرد، ئەمەش مشتێكە لە خەرواری ئەو هەڵوێستەیان:
١- زانیان كە باوە ئەحمەد[٦١] تیماری بریندارى شۆڕشگێڕانی كردووە هاوردیان لەبەرچاو ئەو خەڵكەدا داركارییان كردو یەك دوو ڕۆژ خستییانە ژوورەوە.
٢- جێگری حاكمی سیاسی ناردی بەشوێن ئەو كەسانە كە قەرزاری میرین یەكێك لەوانە (ڕەشید بەلەگە) ناوێك بوو كە هاتە پێشەوە تكای لە حاكم كرد ماوەی بدات چونكە ئێستا پارەی بەدەستەوە نییە، جێگری حاكمیش شاخاندیە سەریا و داوای لێكرد ئیستەرەم ئەبێ زوو بیژمێرێت، ئەویش بەزەردەخەنەیەكەوە وتی (قوربان والله نیمە، ماوەم بدە) جێگری حاكم شێرگیرتر بوو هاواری كردو وتی (لە حزوری مندا پێ ئەكەنی، ئەبێ هەزار ڕوپیەش سزای ئەم پێكەنینەت بجرنگێنی) ئەویش لەمە سەری سوڕما وتی (قوربان، هەزار هەزار، ڕوپیەی چی؟) حاكمیش نەڕاندییەوە بەسەریا وتی ئەبێ سێ هەزار ڕوپیە بدەی ئەگینا خراپتر ئەبینیت، ئەویش كە ئەمەی بیست زارە تەرەك بوو كەوتە سەر ئەرزو گیانیدا بەدەستەوە[٦٢].
٣- بەكرێ گیراوان بەبەرچاوی كاربەدەستانەوە دەست درێژیان ئەكردە سەر خەڵك، هەندێ لە سەربازە چاوشینەكانی بەریتانی مریان لە چەند خێزانێك خۆش كردبوو، بەتەمابوون دەست درێژی بكەنە سەر ئابڕوی خەڵك، ئەم دەنگوباسە گەیشتە (شێخ حەمید) كتوپڕ دەماری بزوتو چاوی پەریە سەری وەك شێرێكی بریندار چووە لای جێگری حاكمو پێی وت (ئەگەر جڵەو ئەم جۆرە دەست درێژی كردنانە شل بكرێت ئاڵای شۆڕش دژیان هەڵ ئەكات)[٦٣]. كتوپڕ هەرچی سەربازییان هەیە لەناو شار دەریان كردنو ڕێگای دەست درێژیان لێ برین ئەم هەڵوێستەی شێخ حەمید لەلاپەڕەیەكی پرشنگداردا تۆمار ئەكرێ.

سەرەڕای ئەم هەموو زەبرو زەنگە كاربەدەستانی بەریتانی دە هەزار ڕوپیە سزایان خستە سەر شاری كفریو لە چەند ڕۆژێكدا ئەم پارەیە كۆ كرایەوەو خرایە مشتی ساحیبەوە. ئەم خۆنواندنەی دوژمنو زوڵمو ستەمكارییەی هێمنییەكی تەواوی نەخستە شارەوەو دەلۆی لەناو شاردا پێ بن بڕ نەبوو، بەڵكو یەكێك لە دەلۆییەكان لە بنەماڵەی (زلفە) شەوێ هەڵ گژایە سەر دیواری (عەبدولكەریم ئاغا) دا تا بیترسێنێت، یاساوڵەكانی ئاغا لە پارێزدابوون لەسەر دیوارەكەوە تەقەیان لێكردو كوشتیان.

* چوونە سەر شۆڕشگێڕان:

هەر كە ئینگلیزەكان كفریان گرتەوە چەكیان دابەش كردە سەر هۆزە لایەنگرەكانیانو داوایان لێكردن بچنە سەر برایم خان، هەندێ لەو بەكرێگیراوانە هەڵیان كوتایە سەر ئاواییە چۆڵ كراوەكانی دەلۆی وەك (گلابات، عەین شكور، فەككە، تەپە چەرموو، كارێز، سەرقەڵا، سەی جەژنی، هەیەرەكەڵو وەلی هەیەر) هەر كەلوپەلو شتو مەكێكیان تیادا وەدەست كەوتبێت رایان ماڵیو ئینجا ئاگریان لە پەل خانووەكانیان بەردا، كاربەدەستانی بەریتانی پاش ئەو ڕاوو ڕووتكردن وێران كردنە بەهەموو شانازییەكەوە ئەم بەیاننامەیان بڵاوكردەوە (..هەرچی دێهاتی دەلۆو دێهاتەكانی تری نزیك كفری بوو هەموو تاڵان كرانو ئاگریان تێبەردرا)[٦٤] و (هەرچی دێهاتەكانی دەلۆی قەزای كفری هەیە هەموو ئاگر تێبەردراو دانیشتووانیان رایانكردە ناو هۆزی عەرەبی عەززەوە)[٦٥]، لە ئاواییەكانی دەلۆ تەنها (كنگربان) بە ساغی مایەوە ئەویش كرا بەخاتری (جەمیل بەگی بابان) ئەبێ ئەوەش بڵێین لەكاتی ئەو ڕاوو ڕووت كردنەو ئاگر تێبەردانە هیچ كەسێكی دەلۆیی لەناو ئەو ئاواییانەدا نەبوون چونكە لەوە پێش هەموویان لەگەڵ وەیسی بەگ ڕوویان كردبووە چیای (حەمرین) ئەگینا هەروا بەئاسانی بۆ بێگانە پەرستان قووت نەئەدران.

ئینگلیز پاش ئەم زەبرو زەنگو تاڵانو بڕۆیە ڕۆژی (٣٠ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٠) خەتی شەمەندەفەری نێوان بەغدادو كنگربانیان دووبارە چاك كرەوەو ئامشۆیان كردنو هاتوچۆ دەستی پێ كردەوە. زەویو زاری دێهاتەكانی ڕۆژئاوای كفری هەموو (دەیمە كاڵە)وجوتیارەكان پشتیان بەباران ئەستورە، جوتیاری دەیمە كاڵیش ئەگەر ساڵێك هاتی بێت چەند ساڵێك نەهاتی دێت بەسەردا، لەبەر ئەمە لە ساڵی هاتدا گەنمەكانیان بۆ ساڵی نەهات قایم ئەكەن، بەكرێ گیراوان پاش ئەو هەموو تاڵانو بڕۆیە چاویان بڕیبووە چاڵە گەنمە شاراوەكانی ئاواییەكانی (فەككە، گلابات، حەمزە گومەت)، ئاغاكانی زەرداو لە حەلەدا دەستێكی درێژیان لەو شەو دزێتیەدا هەبوو، گاڵیان ئەداو خەڵكیان ئەناردو بەشوێن كەری تۆپیدا ئەگەڕان تا ناڵەكانی بكێشنەوە، دەلۆ ئاوارەكانی حەمرین بەم كەینەو بەینەیان زانیو بڕیاریاندا بەڕۆژی ڕووناك تۆڵە لەو بەكرێ گیراوانە بكەنەوە بۆ ئەم مەبەستە (٦٢) شۆرە سواریان ئامادە كرد، دوانزدەیان لە هۆزی عەززەی هەڤاڵیان بوو شەوێ كەوتنەڕێو تا گەیشتنە سنووری گوندی زەرداو[٦٦].

لەوێ خۆیان قایم كرد، دەنگیان نەكرد تاوەكو ڕانە پەزی ئاغاو دەوڵەمەندەكانی ئاوایی كەوتنە ئەو دەشتەو لە ئاوایی دووركەوتنەوە لە پڕێكا دەورەیاندان هەرچی مەڕو بزنو گاو مانگا هەیە هەموویان دا لەبەرو ڕوویان كردەوە چیای حەمرین بەمە (یەكەم) بوونی خۆیان پیشان دوژمنان دایەوە (دووەم) تۆڵەی چاڵە گەنمە دزراوەكانیان لە بەكرێ

گیراوان سەندەوە.

کاتێك دوژمن بەمەی زانی سەریان لەوە سوڕما چۆن بەشەوێك ئەم سوارانە حەفتا کیلۆمەترەیان بڕیو هاتنە سەر زەرداو مەڵبەندی دوژمنان بوو، کتوپڕ دوژمن هەرچی سوارەیەکی هەبوو کۆی کردەوەو ها لێرەو لەوێ کەوتنە شوێن شۆڕشگێران تا لەریزە شاخەکانی (عەین فارس)[٦٧].

بەرامبەریان وەستان، لەناو ئەو دۆڵو ڕیزە شاخانە شەڕێکی قورس لەنێوان هەردوولا قەوماو لەو شەڕەدا عەباس مارف خاڵەی موختاری زەرداو شێخ سابیری تاڵەبانی کوژران و سەمەد ئاغای زەنگەنەش بریندار بوو یەك کەسیش لە شۆڕشگێران کوژرا، بەکرێ گیراوان کوژراوەکانیان بردەوەو بەمایە پووچی گەڕانە دواوە. شۆڕشگێرانی دەلۆ هەروا بەدەستە پارچە لە چیای حەمرین دانەنیشتبوون بەڵکو ڕێگەی نێوان (کفری)و (قەرەتەپە) یان خستبووە مەترسییەوە، لەسەر ئەو ڕێگایە چار بە چار بۆسەیان ئانەناو چڵکاو خۆرێکیان ئەکرد بەتەڵەوە چارێکیان وەکیلی مودیری ناحیەی قەرەتەپەو چەند پۆلیسێك ئەگرن، مودیر جانتایەکی پڕ لیرەی پێ بوو بریتی بوو لە مەعاشی ئەو مانگەی فەرمانبەرانی قەرەتەپە، وەکیلی مودیر (جومعە ئەفەندی) خەڵکی کفری بوو پۆلیسەکانیش هەر خەڵك ئەو ناوەبوون کە بردیانە لای یەکێك لە سەرکردەکانیان جومعە ئەفەندی زۆر تکا ئەکات کە خۆیو پۆلیسەکان بەرەڵڵا بکەن ئەوانیش پارەکەیان ئەدەنەوەو بەرەڵڵایان ئەکەنو زۆر سوپاسی شۆڕشگێران ئەکەن کە ئەگەڕێنەوە دواوە ئەمە بە قایمقام ئەگەیەنن، ئەویش لە پیاوەتی ئەو نەبەردانە زۆر دلخۆش ئەبێتو داوا لە جومعە ئەفەندی ئەکات بچێتەوە لایان ئەو کەسەی پیاوەتی لەگەڵ کردبوو تکای لێبکات بێتە لای قایمقام گفتوگۆی لەگەڵ بکات، ئەمیش ناچار گەڕایەوە ناو شۆڕشگێرانو داواکەی قایمقامی پێ گەیاندن ئەوانیش کتوپڕ هەردووکیان (محەمەد عەبدولرەحمان کارێزیو کاکەمەند ئەمین دەروێش) بێ ئەوەی دڵیان بترسێت شەوێ ئەچنە کفریو چاویان بە قایمقام[٦٨]. ئەکەوێ ئەویش لە نەبەردی ئەو شۆڕشگێرانە دلخۆش ئەبێتو ئەمەش ئەبێتە هۆیەك بۆ ئەوەی ڕاپۆرتێك بۆ کاربەدەستانی بەغداد بەرز بکاتەوەو داوا بکات لە دەلۆییەکان خۆش بنو بگەڕێنەوە سەر ئاواییەکانی خۆیان[٦٩].

*** ئایا برایم خان چی بەسەرهات؟**

پاش ئەوەی برایم خان لە کفری دەرچوو، چووە ئاواییەکەی خۆی ئەو شەوە خەو نەچووبووە چاوی، نەخۆیو نەسوارەکانی دەورووپشتی لە دوژمن دڵنیا نەبوون، ماڵو منداڵیان زوو ڕەوانەی ناو چیا دوورەکان کرد خۆیان چەند ڕۆژێك لەو ناوچەیە مانەوە، ئەوەندەی پێ نەچوو (شێخ وەهابی تاڵەبانی)و هێزێك لە بەکرێ گیراوان هاتنە سەریان برایم خانو ئەکبەری برای حەمە وەرکەیان لێ ڕاپەڕی بەو سێ کەسە توانیان دڕ بە هێزی دوژمن بدەنو خۆیان دەربازبکەنو[٧٠] بدەنە هەردەو چیاکاندا، شێخ وەهاب پاش ئەو تێکشکاندنە دای بەسەر ئاواییە چۆڵەکانی (سەر قەڵاو سەی جەژنیو وەلی هەیەر) هەر شتێکی تیا مابوو بۆ خۆیان باریان کردو ئاگریان لە ئاواییەکان بەرداو بەرەو دوا گەڕانەوە کفری.

برایم خان بڕیاری دا ئاواییە ڕووخاوەکانیان ئاوەدان بکەنەوە هات لە پێشدا ئاسیاوەکەی چاك کردەوەو خستییەوە کار، ئینگلیزەکان بۆیان دەرکەوت ئەگەر (برایم خان) لەو ناوچەیە بمێنێتەوە ژیانیان پێ تاڵ ئەکات، هاتن دووبارە هێزێکی گەورەتریان ناردە سەر، ئەویش خۆیو هێزەکەی کە بریتی بوون لە چل پەنجا سوارێك کشانەوە دواوەو لە شاخەکانی دەورووپشتی دێهاتەکانی (پەلە وشك، زەرد، قەڵا سێوەکە، مەلا مەحموود)[٧١].

خۆیان قایم کردبوو، هێزە سەرەکییەکەی دوژمن بەسەرۆکایەتی (شێخ وەهاب) بوو هێزێکی دیکەی بەریتانیا لە خوارەوە لە کەلارەوە بەرێ کەوتن تا ئەوانیش ئەولا لە برایم خان بگرنو بەهەردوولا هێزەکە ئابلوقە بدەن، ئینگلیزەکان داوایان لە (کەریم بەگی جاف) کرد کە ئەویش بە هێزیکەوە پشتگیریان لێ بکاتو بەڵکو هەموویان بچنە سەر برایم خان، کەریم بەگیش هات بە نهێنی کاغەزێکی بۆ (برایم خان) نووسیو هەڵوێستەکەی بۆ ڕوون کردەوەو داوای لێ کرد ئەمجارە هێزی دوژمن زۆر گەورەو قورسە چاکتر ئەوەیە بێ خوێن ڕشتن خۆی دەرباز بکات[٧٢].

کاغەزەکەی کەریم بەگ کاری لە برایم خان نەکرد، بەڵکو دەستی کردە سەنگەر هەڵکەندنو بەرەنگاری کردنی ئەو هێزە قورسەی بەریتانیا ئینجا سەرۆك تیرەکانی (تەرخانیو ڕۆغزایی) چوونەوە سەر برایم خانو تکایان لێ کرد کە ئاواییەکانیان نەبێتە ژێر پێی سوپای بێگانەوە، ئەمجارەش برایم خان بڕیاری کشانەوەی داو[٧٣] ئەو ناوچەیەی بەجێ هێشتو ڕووی کردە ناو داودەی کوردستان، لەوێ داوای لە حەمە خورشید ئاغای داودە کرد پشتگیری بکات لەو ناوچەیە بتوانن درێژە بە شۆڕش بدەن، بەڵام لە کار ترازابوو (حەمە خورشید) چووبووە ساڵەوەو تینو تەوژمی جارانی نەمابوو هۆزەکەشی پاش تێکشکانی شۆڕشی دووز پەرتو بڵاوبوبونەوە، برایم خان لێرەش بە دڵشکاوی گەڕایەوە، دوژمن دوور بە دوور بەشوێنیانەوە بوون، شۆڕشگێرانیش چەند ڕۆژێك بوو حەسانەوە چییە نەیان چێشتبوو، تامی زادیان نەکردبوو، غەمو پەژارە برایم خانی داگرتبوو وەك مۆم سەعات بە سەعات ئەتوایەوە زەردو لاواز ئەبووەوە، دوژمنان لە هەموو لایەکەوە پێو شوێنی برایم خانیان هەڵگرتبوو بەڵام ئەوندە سامی لەبەر چاویاندا گرانبوو نەیان ئەوێرا دەستەو یەخەی بنەوە، دوژمنان ئەوەیان ئەویست کە لە خەوی شیریندا بچنە سەر برایم خانو بەزیندویەتی دەستگیری بکەن، ئەویش ئەگەر چاوێکی بکەوتایەتە خەو چاوەکەی تری باخەوەر بوو، برایم خانو سوارەکانی گەڕانەوە دواوە تا گەیشتنە پشت ئاوایی (قوڕی چای)[٧٤] ویستیان لە دەربەندەکەوە ڕوو بکەنە دەشتی بەیات ڕوانیان وا قەرەوڵو یاساوڵی دوژمنان قورگی دەربەدەکەیان تەنیوەتەوەو لە پارێزدانو بەئاسپایی گەڕایە دواوەو چیا بەچیا بەرەو دووز ڕۆیشت کە تاریك داهات لە نزیك ئاوایی

(غەرە)ەوە لە زنجیرە چیاکان هاتە خوارەوەو رووی کردە دەشتی بەیات تا گەیشتە ئاوایی (تەل شەرەف)[75].

سەرۆکی تیرەی (دەلالۆ)ی هۆزی بەیات پێشوازییەکی گەرمی برایم خانی کرد، ئامانجی برایم خان ئەوەبوو ئەو شەوە لەوێ بحەسێتەوە بۆ رۆژی دووەم روو بکاتە چیای حەمرین و تێکەڵ بە خزم و کەس و کارەکەی بێتەوە. (محەمەد حەسون) سەرۆکی تیرەی (دەلالۆ) حاڵەکاتی دوا شەوی برایم خانی بەم چەشنە گێڕایەوەو وتی (نەخۆشی تەنگی بە برایم خان هەڵچنی و رادەی تای تا ئەهات لە لەشیدا بەرز ئەبووەوە شەو بەدەم خەو لەنوێنەکەی راست ئەبووەوەو ئەیوت پاڵەوانەکان خۆتان رابگرن، ئەم راپەرینەمان بۆ سەربەرزیمانە، ئەبێت زاڵ ببین بەسەر دوژمن و لە خاکە پیرۆزەکەمان دەریان بکەین، برایم خان وەك ئەوەی بڵێی لەسەر لوتکەی چیای باوە شاسوار راوەستابێت وەهابوو وێنەی ئەو شۆرە سوارانەی بەر چاویا تێئەپەری کە بەهەموو هێزێکیانەوە بەرەنگاریان لەسەربەرزی و ژیانی دانیشتووانی کفری ئەکرد[76].

کە رۆژ بووەوە برایم خان ئەو پاڵەوانە نەبەردە لەبەردەم مردن چۆکی دادابوو، دەیەها کەس لە هۆزی بەیات ئەیانەویست بچنە ژێر تەرمەکەیەوە، هەڵیانگرت و بەهەموو رێزێکەوە تەرمەکەیان لە گۆڕستانی ئاوایی (عومەر مەندان) بەخاك سپاردو ئەو سوارانەی لەگەڵیا بوون روویان کردە چیای (حەمرین) تا دەنگوباسی مردنی سەرکردەیان بەقەومەکانیان بگەیەنن.

کۆچی دوایی برایم خان لەهەموو لایەك بڵاوبووەوە، دوژمن هێشتا لەم دەنگوباسە تەواو دڵنیا نەبوو بۆیە هەواڵەکەی بەم چەشنە بڵاوکردەوە (برووسکەیەکمان لە کەرکوکەوە بۆ هاتووە ئاگاداری کردووین برایم خانی دەلۆ لە گوندی تەل شەرەف نزیك دووز مردووە، نازانین ئەم دەنگوباسە راستە یان نا؟)[77].

ئینگلیزەکان پاداشتێکی چەوریان بۆ ئەو کەسە دانابوو کە برایم خان دەستگیر بکات و بەزیندوێتی پێشکەشی ساحیبی بکات وا برایم خان کۆچی دوایی کرد، ئینجا چڵکاو خۆرەکان پیلانێکیان دانا شەوێ بچن تەرمەکەی برایم خان لە قەبرەکەی دەربهێنن بیدەنە دەست ئاغاکانیان تا دڵیان ئاو بخواتەوەو چەند رۆژێك هەڵیواسنە سێدارەوە، شۆرشگێران بەم پیلانە بۆگەنەیان زانی پێش ئەوەی دوژمنی بگاتە سەر، هاتن دەمی قەبرەکەیان هەڵدایەوەو تەرمەکەیان لێ دەرهێناو قەبرەکەشیان وەك خۆ پڕکردەوەو لەدوورەوە کەوتنە چاودێری کردنی تاوەکو بزانن ئاخۆ ئەو دەنگوباسە راستە یان نا؟

تەرمەکەیان بەهەموو رێزێکەوە گواستەوە چیای حەمرین لەوێ لە گۆرستانی (سنێدیج) بە خاکیان سپاردەوەو لەو ناوە چل رۆژ پرسەیان بۆ دانا ولە هەموو لایەکەوە بۆ دڵنەوایی خەڵکەکە رووی تێنەکردن. بۆ رۆژی دووەم بەکرێ گیراوان هاتنە سەر قەبرە خاڵییەکەو هەڵیانکۆڵی تەماشا ئەکەن تەرمەکە نەماوە، لە زیرەکی و هۆشمەندی شۆرشگێران واقیان ورما خۆیشیان بەروو رەشی و دەست خاڵییەوە گەرانەوە لای ساحیبەکەیان و ئەمجارەش پاداشتەکەیان وەرنەگرتەوە نە بەزیدوێتی برایم خانیان دەستگیر بوو نە بە مردوییەتیش تەرمەکەیان دەستکەوت.

رۆژی مردنی برایم خانی بەتەواوەتی ساغ نەبووەتەوە، بەڵام بەپێی نووسینی رۆژنامەی (پێشکەوتن) دوور نییە لەسەرەتای مانگی کانونی دووەمی ساڵی (١٩٢١)دا کۆچی دوایی کردبێت وەهایە، بەم جۆرە بۆمان دەرئەکەوێت پاش گرتنەوەی (کفری) لەلایەن دوژمنانەوە لە (١٠ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٠) تا رۆژانی (١ تا ٣ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٢١) واتە نزیکەی سێ مانگ و نیو برایم خان لەچیاکانی رۆژهەڵاتی کفریدا ماوەتەوەو خۆی نەداوە بەدەستەوە.

*** گەرانەوەی دەلۆ بۆ سەر ئاواییەکانیان:**

رۆژی ٣٠ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٠ بەرۆژی هەڵگیرساندنی شۆرشی ساڵی بیست دراوەتە قەڵەم لەو رۆژەدا هۆزی (بەنی جەحیم) هەڵیان کوتایە سەر بەندیخانەو (شەعلان ئەبولجۆن)ی سەرۆکیان لەبەندیخانە دەرهێناو شۆرشێکیان بەرپا کردو شۆرشەکە تەنیەوە تا شارەکانی سەر رووباری فورات و بەغدادو رومادی و بەعقوبەو شارەبان و دەلتاوەی گرتەوە، بەریتانیا بەسوپایەکی زۆرەوە هەڵی کوتایە سەر شۆرشگێران لە ماوەی دوو مانگدا ئەو شۆرشە کپ کرایەوەو هۆزو تیرەکانی فورات یەك لەدوای یەك چەکیان فرێدا تەنها هۆزی شۆرشگێری (بەنی جەحیم) نەبێت چەکی فرێنەداو بەرامبەر دوژمن راوەستا، سوپای بەریتانی لە رۆژی (١٢ی تشرینی دووەمدا بە سوپایەکی یەکجار گەورەوە هەڵی کوتایە سەر ئەو هۆزە، ئەوانیش بەرەنگارییەکی توندو تیژیان لە بوونی خۆیان کرد پەنجا کەس لە داگیرکەران کوژران، ئینگلیزەکان ترسیان لێنیشت نەوەکو جارێکیتر شۆرش بتەقێتەوە کەوتنە گفتوگۆ کردن لەگەڵ سەرۆکەکانیاندا رۆژی ٢٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٠ رێکەوتن نامەیەکیان لەگەڵ سەرۆکی (بانی جەحیم) مۆرکرد[78].

ئەم مێژووەش بەتەواو بوونی شۆرشی بیست دانراوە، پاش تەواو بوونی شۆرش بەشەش مانگ حکومەتەکانی عێراق رۆژی ٣٠ی مایسی ١٩٢١ لێبوردنێکی گشتیی (عەفو عام)ی[79] بڵاوکردەوە، قومسێر (مفەوەن)ێکی خەڵکی کفری (عەلی غالب قاسم)[80]. ئەم لێبوردنە گشتیە ئەباتە چیای حەمرین و (وەیسی بەگ) ئاگادار ئەکات، ئەویش رێزی ئەگرێت و سوپاسی ئەکات و بەرێی ئەخاتەوە، لەگەڵ هۆزەکەیدا کۆبوونەوەیەك ئەکات، ئینجا ئەچێتە لای (حەبیب خەیزەران)ی سەرۆکی شۆرشگێرانی (عەززە) ئەویش راو بە ختەکەی پێکەیشتبوو، شۆرشگێرانی هەردوو هۆز دوعا خوازی لەیەك ئەکەن و بریار ئەدەن هەمیشە پەیوەندییان لەگەڵ یەکتردا پتەوتر بێت و[81] داوا ئەکەن هۆزەکەیان پاش خۆیان بۆ بەرژوەندی گشتی ئەم رێرەوە بەرنەدەن. شۆرشگێرانی دەلۆ پاش ئاوارەبوونێکی دە مانگی[82]. بەسەربەرزییەوە گەرانەوە سەر قشلاخەکانیان، دەستیان کردەوە خشت برین، بەك دوو مانگی پێنەچوو هەر خێزانێك

خانووبەرەیەکی بۆ خۆی دروست کردو دەستیان دایە کشتوکاڵ کردن، ساڵ وەرچەرخا هەموو ئاواییەکانی دەلۆ وەك چاخی جاران ئاوەدان بوونەوەو چستو چالاکی کەوتە ئاوەوە.

*** ئایا شۆرشی برایم خان چی هەڵەیەکی کەوتووەتەبەر؟**

برایم خان خۆی پیاوێکی نەبەردو بەتواناو دڵ نەرم بووەو لەلایەن خزمو خوێشو هۆزەوە خۆشەویست بووە چاوی لە ماڵی دنیاو کورسیو پایە پۆشیوە، بەڵام لە فەرمانرەواییدا تاقیکردنەوەیان نەبووە دەستو پێوەندی ئەو فەرماندەیە لەزانینو نەزانین چەند هەڵەیەکیان کردووە، هەندێك لەو هەڵانە لە نەفامییەوەیەو هەندێکیان ئەوەندە زەقن لەسەرەنجامدا برایم خان خۆیشی ئەگرێتەوە.

*** ئەو هەڵانەی کە لە نەفامییەوە کراون وەك ئەمانەی خوارەوە بوون:**

١- پاش رزگارکردنی کفری یەکێك لە هاوپەیمانەکانی ئەچێتە سەر برایم خانو پێی ئەڵێت ئێمە وا کفریمان گرت با بەگورێس لەناو خۆماندا بەشی بکەین، ئەمبەر ئاوەکە[٨٣] بۆ ئێمەو ئەو بەریشی بۆ ئێوە بێت، برایم خانیش پێی ئەڵێت ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووین کفری دابەش بکەین بەڵکو بۆ رزگار کردنی شارەکە هاتووین.

٢- کە (یوسف دەلال) لەناو کفریدا بەناو برایم خانەوە بەیاننامە ئەخوێنێتەوە دیسانەوە ئەڵێن یەکێك لەوانە بە یوسف ئەڵێت (یەسو، یەسو، ئەوا چەند لیرەیەكو ناوی منیش بخەرە پاڵ ناوی برایم خانەوە).

٣- جارێکیان کابرایەکی لادێی شتومەك لە دوکانێك ئەکرێو پارە ناداتە کابرای بەقاڵو شانازی بەخۆیەوە ئەکات، ئەویش ئەچێتە سەر برایم خانو برایم خانیش پارەکەی بۆ ئەژمێرێو سزای ئەو کابرایە ئەدات.

* ئەو هەڵانەی کە زۆر زەقنو ئەکەونە ئەستۆی برایم خانو دەستو دایەرەیەوە، ئەمانەی خوارەوەن:-

١- لەچواردەی ئابی ساڵی (١٩٢٠)دا شۆرشگێرانی (دەلۆ) شاری خانەقینیان رزگار کرد لە ٢٢ی ئابیشدا برایم خانی دەلۆ شاری کفری رزگار کرد ولە ٢٠ی ئابدا شۆرشگێران داودەو بەیاتو دووزیان رزگار کرد، واتە لە ماوەی یەك هەفتەدا سێ شاری لەیەکتر نزیکەوە رزگار کران، هەڵەی شۆرشگێران لەوەدا بوو نەهاتن پەیوەندی لەگەڵ یەکتردا پتەو بکەنو گوندو دێهاتو شارو شارۆچکەکانی نێوان ئەم شارانەش لە دوژمن پاك بکەنەوە بەپێچەوانەی ئەمانەوە شۆرشگێرانی فورات ناوچەی نێوان شارەکانیان لە دوژمن پاككردەوە، ئەم پەرت بوونو هەرکەس بۆ خۆیەوە؟، یارمەتی دوژمنیدا بەئاسانی یەك لەدوای یەك هەرسێ شارەکە بگرێتەوە.

٢- زۆربەی کەسانی ئەو ئەنجومەنەی برایم خان دایناپوو لە هۆزی (دەلۆ) بوون، ئەبوایە لە دانیشتووانی شار چەند کەسێکیان بەشێوەیەکی کاریگەر بەشداریان تیادا بکردایە.

٣- لەنزیك کفری سەربازگەیەکی بەریتانی لای (کنگربان) هەبوو ژمارەی سەربازانی ئەو سەربازگەیە رۆژ بە رۆژ کەم ئەبوونەوە تاوەکو لە ١٧ی ئابدا لە دوو سرییەوە دوو فەسیلیان مایەوە کە فەرماندەکەیان کاپتن (ئەدلەر) بوو[٨٤]، برایم خان ئەیتوانی کتوپرو گەرم گەرمی بچێتە سەر ئەم هێزەو دەستگیریان بکات نەوەکو ببێتە بنکەیەك[٨٥] بۆ خۆکۆکردنەوەی دوژمن.

٤- ئاوایی (زەرداو) کە لەبن دەست کفریدا بوو بەئاشکرا کرابووە شوێنی کۆبوونەوەی ئەو سەرۆك هۆزانەی کە دژ بەشۆرش بوون، دیسانەوە هێزەکانی شۆرش لە یەکەم هەفتەدا ئەیانتوانی بەئاسانی ئەو ئاواییە لە دوژمن پاك بکەنەوە.

٥- جێگری حاکمی سیاسی بەریتانی لە کفری (سلمنت) بەدیل گیرابوو، دیلێکش کە ئەو کێشو سەنگەی هەبووبێت ئەبێت لە نزیك فەرماندەیی شۆرشدا چاودێری بکرێتو بپارێزرێ نەك چارەنووسی بدرێتە دەست کابرایەکی نەزانی نەفام.

*** بۆ شۆرشی برایم خان بەرپا بوو؟**

زۆربەی ئەو خاڵانەی کە بوونەتە هۆی هەڵگیرساندنی شۆرشی ساڵی بیست بوونەتە هۆی هەڵگیرساندنی شۆرشی برایم خانیش جگە لەوانەش ئم خاڵانەی خوارەوە پاڵپێوەنەرێکی تایبەتن کە تەوژمی خستبێتە سەر راپەرینی ئەم شارەو ئەو شۆرشگێرەوە:

١- کفری کەوتبووە سەر شارێگەی بەغدادو سلێمانی هەر رووداوێك لەسەر ئەو خەتە رووی بدایە کاری ئەکردە سەر کفری، کە شێخ سەعیدی حەفید لە موسڵ کوژرا، خەلیل منەوەر لە کفرییەوە داستانێکی بۆ ئەو کارەساتە هۆنیەوە، کە شێخ مەحمودی حەفید لە ساڵی (١٩١٩)دا لە سلێمانی شۆرشی بەرپا کرد برایم خانی دەلۆو وەیسی بەگو عەلی ئاغای زەنگەنە چوون پیرۆزباییان لێکردو پشتگیرییان لە شێخ کرد، کە شۆرشی بیست لە بەغداوە گەیشتە خالس ئەو شۆرشە دڵو دەروونی شۆرشگێرانی کفری گەرم کردەوەو کاری کردە سەر جەماوەر.

٢- لە شارەکانی ئەم ناوچەیە لە کفریدا پتر بزووتنەوەیەکی رۆشنبیری سەری هەڵدابوو بەهۆی بوونی قوتابخانەی (روشدیە)و چوونی دەرچوانی بۆ بەغدادو ئەستەمبوڵو هاتنی رۆژنامەو کتێبەکانی ئەو حەلەو بڵاوبوونەوەی بیروڕای یەکسانیو ئازادیو بوونی کتێبخانە لە دیوەخانەکانی مەجید پاشاو سەید موحسین ئاغاو سەرهەڵدانی چەند شاعیرێکی ناودار.

٣- هۆزی (دەلۆ) کە فەرماندەی شۆرشی گرتبووە دەست لە مێژوودا خەباتێکی هەبوو دژی چەوسێنەری عوسمانی، هەروەها لەناو ئەم هۆزەدا چینێکی چەوسێنەر (دەرەبەگ) نەبوو برایم خان یان وەیسی بەگ وەك جووتیارەکانی دیکەی دەلۆ بەدەست خۆیان کشتوکاڵیان ئەکرد ئەمەش هۆیەك بوو بۆ قبووڵ کردنی فەرماندەیی ئەم هۆزەو ئەو سەرکردانەیان لەلایەن جەماوەرەوە.

٤- کاربەدەستانی بەریتانی بە زۆری کوتەكو چۆماغ

بێگاریان بە جووتیاران‌و دانیشتووانی شار ئەکرد بۆ دروست کردنی خانووبەرە بۆ سەربازگەکانیان‌و راکێشانی هێڵی شەمەندەفەر، ئەفسەرە بەریتانییەکان زۆڵم‌و زۆریان گەیشتە رادەیەك کە دانیشتووانی شار داد بەرنە برایم خانی دەلۆ.

٥- پەیوەندی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی نێوان هەرێمی کفری لەلایەکەوە شارەبان‌و خالس‌و بەعقوبە لەلایەکی ترەوە بەهێز بوو، هەمیشە کاروانی ئەو شارانە بەبارە خورماو میوەجاتەوە ئەهاتنە کفری‌و لە سەرەوە دانەوێڵەو توتنی کوردستانیان بار ئەکرد، هۆزی (دەلۆ)ش لەگەڵ هۆزەکانی (عەززەو لهێب)ی عەرەبی پەیوەندی بەهێزیان هەبوو ئەم پەیوەندی نێوان کوردو عەرەبەی ئەم ناوچەیە وەهای لە دوژمن کرد کە بڵێت (ئەو کوردانەی کە پروپاگەندەی عەرەب سەری لێشێواندبوون بە ئاسانی بەسەریاندا زاڵ بووین، برایم خان خۆی رای کردو پیاوەکانی ئاوارە بوون، رفعەت بەگی داودەش چووە خاکی ئێرانەوە)[٨٦].

*** ئافرەت لە شۆرشی برایم خاندا:**

ئافرەتی کوردەواری بارێکی گرانی کەوتووەتە ئەستۆ، منداڵ بەخێو ئەکات، کاروباری ناوماڵ بەجێئەهێنێت، خزمەتی مێردەکەی ئەکات، میوان بەرێ ئەخات، شان بە شان براو قەومەکانی مەڵۆ ئەنێتەوە درەو گێرە ئەکات، خەرمان هەڵئەگرێت، بەدڵ‌و دەروونێکی پاکەوە نوێژو تاعەتی خۆی ئەکات، کە ئاگری شەر لێیانەوە نزیك بووەوە دەست ئەداتە چەك وەك شێر ئەچێتە پێشەوە تێکرا ئافرەتی ناو کوردەواری سەنگین‌و بە تواناو بە ئارام‌و پاك‌و تەمیزە.

کاتێ (نەنەخان) دایکی برایم خان بیستی هەردوو کورەکەی (کەمەر خان‌و حوسێن خان) بەدەست سوپای تورك شەهید کراون پرچی نەرنیەوەو نەرووخا بەڵکو دانی بە خۆیا گرت‌و چوو نوێژی لەسەرکردن‌و تەرمەکانی بە خاك سپاردن. حەلیمەی دادام[٨٧]. بۆی گێرامەوە چۆن بەبرە ئافرەتێك بەرەنگاری چاوشێکی دلرەقی عوسمانی بوون کە هەمیشە بەزۆر دانەوێڵەی لە خەڵك ئەستاند، ئەو برە ئافرەتە توانیان چاوشە مل سوورەکە مار کوژ بکەن‌و ئینجا بە قۆڵ بەستراوی بیدەنە دەست سەربازگەی عوسمانییەوە.

یەکێك لەو ئافرەتانەی کە بەشداری لە شۆرشی برایم خان کرد (نەعەنێر)ی بەناوبانگ بوو، (نەعەنێر) ناوی (نەعیمەی کچی مستەفا)ی دەلۆییە شوو ئەکاتە (عەبدولباقی) لاوێکی تورکمانی کفری، لە مێردەکەی ساڵی (١٩١٠) ئیبراهیمی کوری ئەبێت، کە سەفەر بەلك بوو ئەبنە سەفەر بەرو ئیتر ناگەرێتە دواوە، چەندە داوای لێ ئەکەن شوویەکی تر ناکاتەوەو دەست ئەکاتە چەخماخسازی (واتە پیشەی تفەنگ چاککردن‌و فیشەك هەڵوەستن) کە شۆرشی برایم خان بوو چووە پاڵی شۆرشگێران‌و بەرگی پیاوانی پۆشی‌و یەکێك بووە لەو کەسانەی لە رۆژی یەکەمی شۆرشدا بە سواری ئەسپەکەی تاوی داوەتە سەر سەرای حکومەت، پاش کۆتایی هاتنی شۆرشی برایم خان گەرایەوە روانی ماڵەکەی تاڵان کراوە هات سەر لە نوێ دەستی دایە بازرگانی لەناو بازاردا دوکانێکی داناو بۆ خۆی چووە سەری ئێستاش لە بیرمە منداڵ بووین بانگی ئەکردینە لای خۆی‌و وردە ئیشی ئەدا بەسەرماندا چونکە تاقانەکەی لەبەر دەستدا نەبوو، ئەم ئافرەتە ساڵی (١٩٣٦)[٨٨] کۆچی دوایی کردو لەبەر ئەوەی ئازاو پیاوانە هەڵکەوتوو بوو ناوی (نەعەنێر)ی بەسەرا سەپێنراو برایم خانی دەلۆش بە (کاکە نەعیم) بانگی ئەکردو رێزی لێئەنا)[٨٩].

تا لەم چەند ساڵەی دواییدا هەر پرسەو شیوەنێك لە کفریدا ببوایە ئەوا (یایە) کە ئافرەتێکی باڵا بەرزی دەنگ زوڵاڵ بوو بەبەیت‌و هۆنراوە پێش ستایش کردنی مردووی ئەو رۆژە بەسەر برایم خاندا بەیتی ئەووت ئینجا ئەهاتە سەر شۆرە سوارانی تری مەیدان‌و بەشی مردووەکەی ئەو رۆژەشی لێئەدا.

*** بەراورد کردنێك لەنێوان شۆرشەکەی شێخ مەحمودی حەفیدو شۆرشی برایم خانی دەلۆ:**

هەر کە سوپای بەریتانی شاری بەسرەی داگیرکردو بەرەو پێشەوە تەکانیدا، ئایین پەروەری‌و هاونیشتمانێتی پاڵی بە جەماوەرەوە نا بەرگری لە داگیرکەری غەیرە دین بکەن، ئەگەر کوژران بەپلەی شەهادەت ئەگەن، هەزار کوردی موجاهید چوونە ژێر ئاڵای شێخ مەحمودەوە بەرەو باشووری عێراق بە خۆیان‌و چەکی دەستیانەوە بەسەر سواری کەوتنەرێ. برایم خان‌و هەڤاڵانیشی[٩٠] رێزی پێشەوەی موجاهیدینیان گرتبوو، شۆرە سواری کورد لە شعێبەدا چوونە کۆری شەرەوە خوێنیان تێکەڵاوی لمی ئەو دەشتە بوو، ئەمە یەکەم ئەڵقەی یەکگرتنی شۆرشگێری بوو لەنێوان شێخ مەحمودو برایم خاندا.

کە شێخ بەرەو سلێمانی گەرایەوەو لە کفرییەوە تێپەرین شەوێك لە ئاوایی برایم خان میوانداریان کرا، کە شێخ مەحمود ساڵی (١٩١٩) لە سلێمانی فەرمانرەوایێکی میللی دانا برایم خانی دەلۆو وەیسی بەگ[٩١] بۆ پیرۆزبایی چوونە خزمەت‌و ماوەیەك لەوێ مانەوەو بوون بە باوەرپێکراوی شێخ لەم ناوچەیەو داوای لێ کردن پەیوەندییان لەگەڵ جەماوەری ناوچەکە پتەو بکەن‌و ئەگەر هاتوو فەرمانرەوایەکەی لەناو چوو ئاڵای شۆرش لە گەرمیانەوە هەڵ بکەن.

حوکمدارێتی شێخ مەحمود لە سلێمانی لە سەرەتای ساڵی (١٩١٩) دامەزرا، پاش ماوەیەکی کەم ئینگلیزەکان لە شێخ کەوتنە برو بیانووو قۆرت خستن بەر، شێخ لە ٢١ی مایسی ساڵی ١٩١٩ دەستی دایە چەك شۆرشی بەرپاکرد شۆرشەکەی لە حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩ بە بریندار کردنی شێخ‌و بە دیل گرتنی دوایی هات.

لەیەك چوونێکی گشتی نێوان شۆرشەکەی شێخ مەحمودی ساڵی (١٩١٩)و شۆرشی برایم خانی ساڵی (١٩٢٠)دا هەیە ئەویش لەم بەراورد کردنەدا خۆی دیاری ئەکات:

١- لە سلێمانیدا (مێجەر سۆن)و هاورێکانی بە چاوێکی سوکەوە دەیانروانیە جەماوەر (عەزیز خان)ی پیاویان لە ساحیبەکەیان توندو تیژتر بوو بە دارەکەی[٩٢] دەستییەوە

لەگەڵ خەڵك گفتوگۆی ئەکرد لە کفریشدا (سلمنت) شێوازە ناهەموارەکەی سۆنی گرتبووە بەرو (ئەبوو چۆماغ)ی هەڤاڵو پیاویشی لە عەزیز خانی لەمەر سۆن درندەتر بوو.

٢- شێخ مەحمود ئینگلیزەکانی بەدیل گرتو لە دەبۆکەی ناو شار حەپسی کردن برایم خان (سلمنت)ی بەدیل گرت، بەلام لەشاردا حەپسی نەکرد بەڵکو ناردیە ئاواییەکەی خۆی.

٣- پاش هەفتەیەك لە ڕزگاربوونی سلێمانی لە چنگ سوپای بەریتانی هێزی ئینگلیزەکان لە تاسلوجەدا بەفەرماندەیی مولازم (پۆل) پەلاماری هێزێکی شێخ مەحمودیانداو شەڕێکی قورس لەنێوانیاندا ڕوویدا لە ئەنجامدا (پۆل)و هەشت کەس لە سەربازەکانی کوژران‌و دوانزدەشیان بریندار بوون[٩٣]، ئەو دوایی هێزەکەشیان پاشەکشەیان لێکرد، لە کفریشدا پاش هەفتەیەك هێزێکی گەورەی ئینگلیزو بەکرێ گیراوان هێرشیان بردە سەر شۆرشگێرانی کفری ئەنجامی ئەمانیش لە ئەنجامی دەست درێژکەرانی سەر هێزەکەی شێخ مەحمود خراپتر بوو.

٤- (موشیری حەمەی مام سلێمان)ی[٩٤] هەمەوەند بووە سەرەنێزەی دوژمن دژی هێزەکانی کورد ئەوەبوو لەدزە ڕێیەکەوە کەوتە پێش سوپای بەریتانی‌و لە شەری دەربەندی بازیانی ڕۆژی ١٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩دا بوو بەهۆی بەدیل گرتنی شێخ مەحمود، لە کفریشدا (شێخ حەمیدی تاڵەبانی)و شێخ وەهابی کوری خۆیان کردە سەرەنێزەی سوپای بەریتانی داگیر کەر دژی شۆرشگێران.

٥- بۆ کوژاندنەوەی شۆرشەکەی شێخ مەحمود بەریتانیاییەکان لە کەرکوکەوە بەفەرماندەی جەنەراڵ (فرایزەر) سوپایەکی قورسیان ناردە سەر شێخ، پاش ساڵێك هەر لەسەربازگەی بەریتانیا لە کەرکوکەوە مێجەر (لۆنگریك) هێزێکی گەورەی نارد بۆ کوژاندنەوەی شۆرشەکانی لەیلان‌و دووزو کفری.

٦- شۆرشی شێخ مەحمود نزیکەی مانگێك دەوامی کرد شۆرشەکەی برایم خانیش نۆزدە ڕۆژی خایاند.

٧- شێخ مەحمود لە ئیستعماری بەریتانیا دڵنیا نەبوو بەرامبەر داگیرکەر چەکی فرێ نەدا ئەوەبوو لە دەربەندی بازیاندا بریندار کرا ئەوسا بەدیل گیرا، برایم خانیش لەهەمان دوژمن دڵنیا نەبوو، پاش خۆکشانەوە، چەکی فرێ نەدا، بەبەڵێن‌و قسەی چەوریان تەفرەی نەخوارد، ئەوەبوو نەبەزیندوێتی چنگیان کەوت وئە بەبریندداری‌و مردوێتی تەرمەکەشیان بەدەست نەکەوت.

*** سەرچاوە و پەراوێزەکان:**

١- ئەم شەرە بەدووەم شەڕی حەمرین ناوبانگی دەرکرد.

٢- بڕوانە: حرب العراق، شكری مەحموود ندیم، چ٤-١٩٠٤، ل ١٧٢.

٣- سێ چەکدارەکە یەکێکیان (برایم حەمە خانی گێژ)و ئەویتریان (حوسێن کاکەمەند)ی دەلۆیی بوو کە زاوای برایم حەمەخان بوو دەلۆییەکی تریان لەگەڵدا بوو.

٤- (سلمنت) یان (سلمون)وە یان (شلێمون) جوولەکەیەکی بەریتانی بوو.

٥- ئینگلیزەکان بۆ بەڕێوەبردنی مەرکەزی لیوا (حاکمێکی سیاسی) بەریتانیان دائەنا و لە قەزاکانیشدا جێگری حاکمیان دائەنا، چ حاکمی سیاسی و چ جێگرەکەی سوپا بوون.

٦- چۆماغ - عەرەبییە، کوردییەکەی (کوتەك) ئەگرێتەوە. (ئەبو چۆماغ) واتە (کوتەك بەدەست) ئەم ئەفسەرە داردەستێکی سەر خڕی بەدەستەوە بوو بە لاستیکێکی پێچ پێچ دەودراو بوو لە موتەك ئەچوو.

٧- (کوپپەك ئوێلدران) واتە (سەگ کوژ).

٨- لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٢دا خوالێخۆشبووان (خەلیل بەگ دەلۆو رەزای ئەمین دەلۆیی) ئەم ڕاستییەیان بۆ گێڕامەوە.

٩- ئەگێڕنەوە ئەڵێن یەکێك لە کوڕی شەڕدا بە (محەمەد ئیسماعیل)ی ووت فلانی ئەوا قاچت پێکرا بکشێرەوە دواوە، ئەویش وەڵامی دایەوەو ووتی: نەخێر نەپێکراوم، شەڕ دوایی هات و سەرکەوتنیان بەدەستهێنا ئینجا ووتی: ئەبێ لە کوڕی شەڕدا ئەگەر برینەکەمان کاری نەبوو وورە بەرنەدەین.

١٠- بڕوانە - ثورة العشرين الوطنية التحررية - (ل. ن كاتلوف)، وەرگێڕی (عبد الواحد كرم)ل (١٤٠) ئەمیش لە ڕۆژنامەی تایمسی لەندەنی ڕۆژانی ٣١/ ٨و ١٩٢٠/٩/١ی وەریگرتووە.

١١- بڕوانە: خانقين خلال ربع قرن (١٩٠٠- ١٩٢٥ فازڵ کەریم ڕۆژی ١٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٠.

١٢- (ماوزەر محەمەد ئیسماعیل) ئەم ڕووداوەی بۆ گێڕامەوە. (ماوزەر) تا ئێستا ماوەو تەمەنی لە نەوەت تێپەڕیوە، کە ئەو ڕووداوانەت بۆ ئەگێڕێتەوە بە جۆرێك ئەکەوێتە جۆش و خرۆشەوە ئەڵێی وا لە گۆڕەپانی شەڕدایە ناهەقیشی نییە لەو ڕۆژەی ئەم لەدایکبووە باوکی چاوی بە تفەنگێکی تازە بابەت هەڵیناوەو ئەوەندە ئەو تفەنگەی خۆشویستووە تا ناوی کوڕەکەی بەناو ئەو ماوزەرەوە ناوی لێناوە.

١٣- (دووز خورماتوو) وشەیەکی تورکمانی کوردی تێهەڵکێشراوە بریتییە لە (دووز، خورما، توو) - (دووز) خۆی (خورما و توو)یشیان کوردییە، لە دووزخورماتووی دەورووپشتیدا ئەم سێ بەرهەمانە هەیە.

١٤- (بەیات) هۆزێکە لەناو خۆیاندا بەشێکیان تورکمان و بەشێکیان عەرەبن کوردیان تیادا نییە، هەموویان (سوننی) مەزهەبن.

١٥- بڕوانە: رحلة المنشئ البغدادي، وەرگێڕ: عباس عەزاوی، ل ٨٤.

١٦- مەبەستی لەسەرا کۆشکەکەی (عومەر بەگ)ی بەغدایە، لە بەغداوە عومەر بەگ ئامادەیی پیشاندا ئەو چەند ڕۆژەی ڕێچ و دەست و دایەرەکەی لەدووزدا بمێننەوە لەو کۆشکەدا بحەسێنەوە.

١٧- تیمار: بەو پارچە زەوییە ئەمیرییە دەگوترا کە لەلایەن دەوڵەتەوە ئەدرایە هەندێ کەس تا دەیەکی دەستکەوتەکەی بۆ خۆیان لێ وەربگرن بەرامبەر بەوەی لەکاتی پێویستدا ژمارەیەك چەکداری ئامادەکراو پێشکەش بەدەوڵەت بکەن.

١٨- دەفتەردار باوکی عومەر بەگەو جاران فەرمانبەری خەزینە بوو.

١٩- بڕوانە: رحله جیمس ریچ ساڵی ١٨٢٠، ل ١٩ - ٢٤.

٢٠- جوغرافیای عوسمانی، چ ١٣٢٨ی کۆچی، ل ١٤١.

٢١- بڕوانە: کتێبی (کورد، ترك، عەرەب)، ئەدمۆندسن، وەرگێڕاوی عەرەبی، ١٩٧١، ل ٢٤٧.

٢٢- (کفری) ئەکەوێتە ناوەڕاستی ڕێگەی (خانەقی - دووز)، دووز لە باکووری کفریدایەو خانەقیش دەکەوێتە باشوورییەوە، (کفری)وەك دڵی شۆڕش وەها بوو (خانەقی) و (دووز)یش هەردوو باڵی شۆڕشەکە بوون، پەیوەندی نێوان سەرۆکی شۆڕشگێڕانی هەرسێ شارەکە هەبوو مەبەستیشیان هەریەك بوو هەموولایەکیشیان برایم خانیان بە برا گەورە دانابوو.

٢٣- ڕۆژنامەی (العراق) ژمارە (٦٨)ی ڕۆژی ١٩ی ئابی ساڵی (١٩٢٠)، هەروەها ڕۆژنامەی (الموصل)ی ژمارە (٢٦٣).

٢٤- بڕوانە: گۆڤاری (الاخاء)ی تورکمانی، عبدالحكيم رژی اوغلو، ژمارە (٧)ی ساڵی (١٩٧٠)، ل ٢٤.

٢٥- (ڕۆغزایی)و (تەرخانی) دوو تیرەی گەورەن لە هۆزی (جاف) لەگەڵ برایم خاندا پەیوەندییان باش بووە ئاوایییەکانیان کەوتبووە ڕۆژهەڵاتی سەرقەڵاوە.

٢٦- بڕوانە: ئەرنۆڵد وێلسن جێگری حاکمی گشتی مەلەکی بەریتانی لە عێراقدا لە سەردەمی داگیرکردندا، شۆڕشی عێراق، بزووتنەوەی کفری، وەرگێڕ: جعفر الخياگ، چ١، ساڵی (١٩٧١)، ل١١٦.

٢٧- (عومان سەلیم وەنداوی) مودیری ماڵ بوو (عەلی ئەفەندی) مودیری ناحیەی قەرەتەپە بوو، فەرمانبەرە پێشکەوتووەکانی ئەو سەردەمە ئەمانەبوون (ڕەفعەت موبارەك) ئەمینی سەندوق (مبارەك ئەفەندی) باوکی مەئموری نفوس بوو، (سەید نوری) سەرۆکی شارەوانی، (عەزیز بەرقی) سەرۆکی دەرەك، (خان صاحیبی هیندی) محاسب، (عزالدین کاتب زادە) مەئمور شعبە، (محەمەد سەعید سوەیلی) موفتی شار، (مەلا بادر) کاتبی بەلەدیە بوون.

٢٨- (محەمەد سەعید وەنداوی)و (بەهجەت بابان) سەر بە شۆڕشی برایم خان بوون و پێشەکی ئاگادارییان لە شۆڕشەکە هەبوو.

٢٩- (جەمیل بەگی مەجید پاشای بابان) پیاوێکی هێمنی لەسەر خۆ بوو سەر بە ڕاپەڕین و شۆڕش نەبوو، زۆربەی دانیشتووانی گوندەکانیان دەلۆیی بوون و پەیوەندی بابانەکان بەدەلۆوە لەوەش بەرەو ژوورتر بوون.

٣٠- لەناو ئەو پۆلیسانەی کە بەتووندو تیژی بەرەنگاری کردبوو (حەمە زەفە) بوو کە خۆی دەلۆیی بوو، پێیان وت بۆ وا بەرەنگاریت کردوویەتی من مەئمورم گەورەکەم چی ئەمرێکی پێدام ئەبێ جێبەجێی بکەم با دژی هۆزەکەی خۆشم بێت.

٣١- (نازم محەمەد سەعید وەنداوی) گێڕایەوە ئەڵێت: ئەوسا ئێمە منال بووین خەریك بووین لاشەی ئینگلیزەکان بەناو شاردا رابکێشین بەڵام گەورەکانمان رێیان نەدایین.

٣٢- برایم خان داوای لە (جەمیل بابان)کرد بەشداری ئەم ئەنجوومەنە بکاتو ئامادەیی ئەوەی پیشاندا سەرۆکایەتی شارەکەی بداتە دەست، بەڵام (جەمیل بەگ) لەگەڵ (شەمسە خان جاف)ی هاوسەریدا بۆ ماوەیەك چوون بۆ (کەلار)، خوالێخۆشبوو (ئەحمەد بەگی جەمیل بەگ) کە لە ساڵی (١٩٧٥)دا کۆچی دوایی کرد بۆی گێڕامەوە کە شەمسە خانی دایکی لە هەڵوێستی جەمیل بەگی مێردی نارەزا بوو.

٣٣- (وەیسی بەگ) سەرۆکی رەسمی هۆزی دەلۆ بوو، برایم خان لە شۆڕشدا هەڵکەوتووتر بوو وەیسی بەگ پشتی برایم خانی بەرنەدا، ساڵی (١٩٢٥) کۆچی دوایی کرد.

٣٤- کاکەمەند یەکێك بوو لە شۆڕە سوارانی دەلۆ، لە سوارەی حەمیدیو شەری شوعیبەدا بەشداری کردبوو، ساڵی (١٩٤٥) لە تەمەنی سەدو دە ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

٣٥- (حاجی محەمەد) یەکێك بوو لە سەرۆکەکانی تیرەی تەرخانی سەر بەهۆزی جاف.

٣٦- (حەمە جان) یەکێك بوو لە سەرۆکەکانی تیرەی رۆغزایی سەر بە هۆزی جاف.

٣٧- (برایم وەستا مەحاو) لە دانیشتووانی شاری کفری بوو، خوشکی وەیسی بەگی مارە کردبوو، کاتبێکی شارەزا بوو، سەر بە شۆڕشگێرانی دەلۆ بوو.

٣٨- خاوەن موڵکی گەورە (دەرەبەگ) ئەو کەسەیە لەنێوان (٥٠٠- ١٠٠٠) هەکتار یا زیاتر زەوی هەبێت، خاوەن موڵکی ناوەندی لەنێوان (٣٠- ٥٠٠) هەکتارە زەوی هەیە، خاوەن موڵکی بچووك لە ٢٠ هەکتارە زەوی کەمتری بەدەستەوەیە.

٣٩- ئەم ئاواییە بە دە کیلۆمەترێك ئەکەوێتە رۆژهەڵاتی کفرییەوە بە ئاوایی (برایم خان) ناوبانگی دەرکردووە، ئێستا سێ ئاوایی بچووکی لێبووەتەوە.

٤٠- (شەرەف کوری برایم خان ١٩١٢) دێیەکی بۆ خۆیو کورەکەی ئاوەدان کردووەتەوە ئەروانێتە سەر دۆڵێکی پر دارو چیمەنو بە حەوت کیلۆمەترێك لە ئاوایی برایم خانەوە دوورە، شەرەف سێ کوری هەیە (محەمەد شکور ١٩٤٦) (محەمەد کەریم ١٩٤٨) (ئەمیر ١٩٥٠)، (عەزیزی برایم خان ١٩١٠ - ١٩٦٧) چوار کوری هەیە (ئیسماعیل ١٩٣٤) (حاجی عاسی ١٩٤٤- ١٩٨٣) (محەمەد ١٩٤٧) (پەروێز ١٩٤٩) لەو گوندە دائەنیشن کە بە ئاوایی برایم خان بەناوبانگەو کەوتووەتە سەر رێگەی کفری - سەرقەڵا (جەعفەری برایم خان) سێ کوری هەیە (حاتەم ١٩٤٨) (بەشارەت ١٩٥٢) بەکر ١٩٥٤)، (حەمیدی برایم خان)یش سێ کوری هەیە (سابیر ١٩٥٢) (حەبیب ١٩٥٧) (سەمین ١٩٦٢) کورانی (جەعفەرو حەمید) ئاواییەکیان بەرامبەر ئاوایی برایم خان بۆ خۆیان ئاوەدان کردووتەوە. کورەزاکانی برایم خان خەریکی کشتوکاڵو ژیانێکی مام ناوەندییان هەیە.

٤١- بروانە رۆژنامەی (العراق) ژمارە رۆژی ٣٠ی ئابی ١٩٢٠.

٤٢- (زەرداو) ئاواییەکە نزیکەی (٢٠) کیلۆمەترێك کەوتووەتە خوار کفرییەوە، زەویو زاری ئەم ئاواییە عائد بە ئەوقافەو تا ساڵی (١٩٢٠) بەدەست ئاغاکانی زەنگەنەوە بووە، لەو ساڵەوە تا رۆژی ئەمرۆمان کەوتە دەست شێخەکانی تاڵەبانیو ئێستا (شێخ عەتای کوری جەماڵ) سەرپەرشتی ئەکات.

٤٣- لەوسەردەمە بە رەشاش (مەتریلۆز) ئەوترا.

٤٤- ئەیان گێراوە کە تاویان ئەدایە سەر هیندیەك ئەیوت (واللە رەفیك موسلمان هەی) واتە (واللە من هاورێتم موسلمانم).

٤٥- بروانە: ابراهیم خان ثائر من کردستان، د. مکرم تاڵەبانی (١٩٧٠، ل ٨٦- ٨٨.

٤٦- بروانە: فصول من تأریخ العراق القریب، مس بێل وەرگێری بۆ عەرەبی جعفر الخیاط ١٩٧١، ل ١٥٢- ١٨٥.

٤٧- بروانە: العشائر الکردیة، وەرگێری بۆ عەرەبی فوئاد حەمە خورشید، ١٩٧٩، ل ١٣٧.

٤٨- بروانە، کورد، تورك، عەرەب، ئەدمۆندسن ١٩٧٦، وەرگێری عەرەبی.

٤٩- (سیامەنسوور) ئاواییەکە لە دەشتی ناوچەی (قەرەحەسەن)ی سەر بەمەرکەزی پارێزگای (تەئمیم - کەرکوك)و کەوتووەتە باشووری لەیلانەوە، ئەم ئاواییەو چوار ئاوای دیکەی ئەو ناوچەیە سەر بە شێخ قادری تاڵەبانی بوونو هەمیشە لە ریزی نیشتمانپەروەراندا بووەو شێخ لەناو خەڵکدا هەر بە شێخ قادری سیامەنسوور ناسراوەو لە ساڵی (١٩٥١)دا کۆچی دوایی کردووە، پاش خۆی شێخ حەبیبی کوری لەسەر رێرەوی باوکی رۆیشتووە.

٥٠- بروانە: رۆژنامەی (پێشکەوتن) رۆژی ئابی ١٩٢٠.

٥١- لەو حەڵە (میلەر) یارمەتیدەری لۆنگریك بوو (مەجید یەعقوبی) سەرۆکی شارەوانیو (مامۆستا ئەحمەد قوتب) قازیو (عەبدولقادر کازم وەنداویش) مودیری مالی کەرکوك بوون.

٥٢- لەو چلو چوار شەهیدە بیستیان لە هۆزی بەیاتو هەژدەیان لە هۆزی داودەو سێیان لە هۆزی سائحی عەرەبو سێی ترشیان لە تورکمانی دانیشتووانی دووز بوون یەکێکیان ناوی (جەعفەر کەچەچی) بووە، هەر لە خەڵکی دووز دەیەها بریندار هەبوون وەك (عەباس قوشچیو موراد تۆپال).

٥٣- روپیە، دراوێکی هیندیە، هەر روپیەیەك بەرامبەر (٧٥) فلسە بە پێی بازاری ئەوساو ئێستا نرخی بەرز بووەتەوە.

٥٤- بروانە: رۆژنامەی (الموصل)ی ژمارە ١٩٢ی رۆژی یەکی تشرینی دووەمی (١٩٢٠).

٥٥- هۆزی (عەززە) یاخود (ئەلعەزە) دژی بەریتانیا ئاڵای شۆڕشیان هەڵکرد بوو شاری (خاڵس - دەلتاوە) یان رزگار

كردو ماوەیەك حوكمڕانیان تیادا كرد، پاش تێكشكانی ئەو ڕاپەڕینە ئەم دوو سەرۆكە خۆیان نەدا بەدەستەوەو روویان كردە چیای (حەمرین)و خۆیان تیا قایم كرد، لەو كاتەشدا شۆڕشی دەلۆش شكستی هێناو شۆڕشگێڕانیش زۆربەیان روویان كردە ئەم چیایە، هەردوولایان لەوێ گرتەوە (وەیسی بەگ) كە چووە دیدەنی شێخەكانی عەزە زۆر ڕێزیان گرت، ئێوارەیەكیان لە دانیشتنێكیانا كابرایەكی (عەزە) لە وەیسی بەگ ڕائەپەڕێ و ئەڵێت ئێمە خوێنێكمان لەبەیندایەو قەرزارمانن (حەبیب خەیزەران) لەمە زۆر تووڕە ئەبێت و رووی دەم ئەكاتە كابرا ئەڵێت (ئێمەو دەلۆ هیچ خوێنێكمان لەنێواندا نەما، هەردوولامان ئێستا یەك دوژمنمان هەیە ئەویش بەریتانیایە) كابرا بێ دەنگ بووو كشایە دواوە (مەجیدی حاجی فەتحوڵلا ئەمەی بۆ گێڕامەوە).

٥٦- بڕوانە: ڕۆژنامەی (پێشكەوتنی) ژمارە ٢٣ ڕۆژی ٢٣ی محرم ١٣٣٩ ڕێكەوتی ٣٠ی سبتمبری ١٩٢٠.

٥٧- هیچ سەرچاوەیەك بەتەواوەتی ئەو ماوەیەی دەستنیشان نەكردووە كە كفری تیادا بە ئازادی ژیاوەو لە ژێر فەرمانڕەوایی برایم خانی شۆڕشگێڕدا بووە، باوكم، كە تەمەنی نەوەت ساڵ پترەو خوێندەوارێكی باشە مێژووی ئەو ڕۆژانەی لەبیرە ئەڵێت (ڕۆژی ١ی ذي الحجەی ١٣٣٨ی كۆچی برایم خان كفری ڕزگار كردو نۆزدە ڕۆژ حوكمرانی تیادا كرد) ئەمەش ئەكاتە نێوان (٢٢ی ئابی ساڵی ١٩٢٠ تا ١٠ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٠). دوو كەس لەپیاوە ناودارەكان و بەساڵاچووەكانی دەلۆ ئەم ڕاستییەیان سەلماند یەكێكیان (كوێخا محەمەدی ئەورەحمان كارێزییە ١٨٩٠- ١٩٨٠) دووەمیان (مەلا سەمین فارس ١٩٠٠- ١٩٨٤) مەلا سەمین خوێندەوارێكی باش بوو پێش سەفەر بەر لە كفریدا گەیشتبووە پلەی (روشدیە - ناوەندی).

٥٨- بڕوانە: ڕۆژنامە (پێشكەوتن) ژمارە ٢١ی محرمی ١٣٣٨ - ڕاستییەكەی ١٣٣٩یە- ئەڵێت (ناحیەی زەنگەنە دانراو عەبدولكەریم ئاغا كرا بە مودیر، مودیری قەرەتەپەش چووە سەر كاری خۆی).

٥٩- (بەهجەت بابان) خۆی نەدا بەدەستەوەو لە بەرچاو وون بوو لەبەر (جەمیل بەگی) برای وازیان لێهێنا (محەمەد سەعید) گیراو تەحقیقی لەگەڵ كرا پاش چەند ڕۆژێك بەرەڵلا كرا، كە چوونە سەر ماڵ (محەمەدی حاجی نوعمان وەنداوی) ئابلۆقەی ماڵەكەیاندا خەریك بوون ماڵەكەی تالان بكەن، سەیدەكانی كفری ڕزگاریان كرد.

٦٠- كەلوپەل و ناوماڵی دەلۆییەكانی ناوبازار خرایە موزایەدەوە كەسێكی ناوشار نەچوونە بەرەوە، بەكرێ گیراوەكان لەناو خۆیاندا دابەشیان كرد.

٦١- (باوە ئەحمەد) یەكێكە لە باوەكانی ڕێبازی كاكەیی، دەمێك بوو لە كفریدا بوو، وەجاغی هەبوو، ئەوی مارو دووپشك پێوەی بدایە یا هار بووایە ئەچووە وەجاغی باوە ئەحمەد، لەناو خەڵكدا پایەو مەقامی خۆی هەبووە، ئێستا (زەینەڵ)ی كوڕی باوەیەو سەرتاشە.

٦٢- (بەهجەت بابان) خۆی نەدا بەدەستەوەو لەبەرچاو وون لەبەر (جەمیل بەگی) برای وازیان لێهێنا (محەمەد سەعید) گیراو تەحقیقی لەگەڵ كرا پاش چەند ڕۆژێك بەرەڵلا كرا، كە چوونە سەر ماڵ (محەمەدی حاجی نوعمان وەنداوی) ئابلۆقەی ماڵەكەیاندا خەریك بوون ماڵەكەی تالان بكەن، سەیدەكانی كفری ڕزگاریان كرد.

٦٣- كەلوپەل و ناوماڵەی دەلۆییەكان ناوبازار خرایە موزایەدەوە كەسێكی ناوشار نەچوونە بەرەوە، بەكرێ گیراوەكان لەناو خۆیاندا دابەشیان كرد.

٦٤- (باوە ئەحمەد) یەكێكە لە باوەكانی ڕێبازی كاكایی، دەمێك بوو لە كفریدا بوو، وەجاغی هەبوو، ئەوی مارو دووپشك پێوەی بدایە یا هار بووایە ئەچووە وەجاغی باوە ئەحمەد، لەناو خەڵكدا پایەو مەقامی خۆی هەبوو، ئێستا (زەینەڵ)ی كوڕی باوەیەو سەرتاشیشە.

٦٥- (جەمیل ئەكرەم كوڕی مستەفا ڕێژی) كە ئێستا تەمەنی لە هەشتا تێپەڕیوە ئەم كارەساتەی بۆ گێڕامەوە.

٦٦- (حاجی حەسەنی وەستا ئەحمەدی قەرەداغی) ئەم ڕووداوەی بۆ گێڕامەوە.

٦٧- ڕۆژنامەی (پێشكەوتن) ژمارە (٢١)ی ١٤ی سبتمبر ١٩٢٠.

٦٨- ڕۆژنامەی (پێشكەوتن) ژمارە (٢٤) ٧ی ئۆكتۆبەری (١٩٢٠).

٦٩- ئەو حەلە ئاوایی (زەرداو) مەڵبەندی دوژمنان بوو، لەو گوندە كۆبوونەوە دژ بە شۆڕش ئەكرا.

٧٠- (عەین فارس) ئاواییەكی هۆزی دەلۆیەو كەوتووەتە سەر سنووری ئەوان و هۆزی لهێبەوە.

٧١- قایمقامی كفری لەو حالە (محەمەد خاڵسی كوڕی شێخ ڕەزای تاڵەبانی) بوو، محەمەد خاڵس شاعیرو سەر بە شێخ مەحموودی حەفید بوو.

٧٢- ئێوارەی ڕۆژی (٢٨ی ئابی ساڵی ١٩٧٩) خوالێخۆشبوو (حاجی محەمەدی ئەورەحمان كارێزی) لە ئاوایی (كارێز) ئەم ڕووداوەی بۆ گێڕامەوە كە خۆی لە ڕووداوەكەدا بووە.

٧٣- لەشەڕدا ئەوەندە ئازایەتی و نەبەردیی و لەسەر بیروڕا سووربوون دەوری لە سەركەوتندا هەیە كەم و زۆری ئەوەندە دەوری نییە، لەشەڕی (بەدر) هێزی دوژمن دە ئەوەندەی هێزی موسلمانان بوو، هێزی موسلمان سەركەوت، ڤێتنام بەسەرژمێرێكی كەمەوە لەسەریەك سەركەوتە سەر سوپا زۆرو مۆڵەكەی فەرەنسا و ئەمەریكا جا هیچ مایەی سەرسوورمان نییە بەسێ كەسەوە زاڵببنە سەر سی كەسی بەكرێگیراو.

٧٤- لەم ئاوایییانەدا تیرەی تەرخانی و ڕۆغزایی دائەنیشن ئەم دوو تیرەی جافە لەگەڵ برایم خان خزمایەتیان هەبوو لە شۆڕشەكەشیاندا هاوكاری یەك بوون.

٧٥- ساڵانی (١٩٤٤- ١٩٤٦) لە كەلار مامۆستا بووم كەریم بەگی جاف خۆی ئەم ڕووداوەی بۆ گێڕامەوەو وتی: ئەو كەسەی كاغەزەكەی پیادا ناردووە (عەلی جەغەرە)ی ناو بووە.

٧٦- جاری یەكەم ئەوە بوو دانیشتووانی كفری داوایان لێكرد بكشێتەوە ئەویش لەشار كشایەوەو ئەمەش جاری دووەمە، چونكە ئەگەر دانیشتووانی ناوچەیەك پشتگیریی شۆڕشگێڕان نەكەن بەرەنگاری كردن لەوناوە بەگران

ڕائەوەستێت.

٧٧- ئەم ئاواییە کەوتووەتە سەر لێواری ئەو تەنگەبەرەی کە ڕووباری (قوری چایی) پیادا ئەڕوات، گوندەکەش هەر بەناو ڕووبارەکەوەیەو کەوتووەتە لاپاڵی شاخەکەوە، (قوری چایی)یش بە تورکی مانای (خره وشکە).

٧٨- ڕۆژی (٢٦ی ئابی ساڵی ١٩٧٩) کاك (شەرەف برایم خان) لە ئاواییەکەی خۆیدا ئەم بەسەرهاتەی دوا ڕۆژەکانی برایم خانی باوکی بۆ گێرامەوە.

٧٩- بڕوانە: ابراهیم خان ثائر من کردستان، د. مکرم تاڵەبانی (١٩٧١)، ل ٩٩- ١٠٠.

٨٠- ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) ژمارە (٣٧) ڕۆژی ٢٦ی ربیع الاخر ١٣٣٩ ڕێکەوتی ٦ی جنوری ١٩٢١.

٨١- ئەو خاڵانەی کە هۆزی بەنی جەحیمو سوپای بەریتانیا لەسەری ڕێککەوتبوون ئەمانەی خوارەوە بوون:

١- حکومەتێکی سەربەخۆ لە عێراقدا دابمەزرێت.

٢- ئەو زەرەرو زیانەی لەم ناوچەیە لە حکومەت دراوە داوای بارمتەی لە هۆزی بەنی جەحیم نەکرێت.

٣- خەرج و باجی ساڵی (١٩٢٠) یان لێ نەسەندرێت.

٤- خۆیان (هۆزەکە) پارێزگاری کردنی هێڵی شەمەندەفەری ناوچەی خۆیان بگرنە ئەستۆ.

٥- ئەمن و ئاساییشی ناوچەی خۆیان بەدەستیانەوە بێت.

٦- ئەو (٢٤٠٠) تفەنگەی کە لە حکومەت دەستیان کەوتبوو بیدەنە دواوە بە حکومەت.

٨٢- لەناوچەی کفری و لەناو هۆزی دەلۆ بەو لێبوردنە بە (ڕاوبەخت) ناوئەبرێت.

٨٣- عەلی کوری قاسم کوری ماڵەڵلایە، برازای موبارەك ئەفەندی و مستەفا ڕێژییە، عەلی غالیب لە قومسرییەوە سەرکەوت تا گەیشتە پلەی مودیری پۆلیس.

٨٤- ئەو پەیوەندییە تا ڕۆژگاری ئەمرۆش هەر پارێزراوە، ساڵی (١٩٨٠) کە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی بوو (کفری و خاڵس) یەك ناوچەی هەڵبژاردن بوو (هیدایت محەمەد عەبدولرەحمان دەلۆیی) خۆی لە کفرییەوە هەڵبژاردبوو چووە ناو عەزەو چاوی بە حەبیب خەیزەران کەوت ئەویش هانی هۆزەکەیدا کە دەنگی خۆیان بدەن بە (هیدایەت دەلۆیی) ئەوەبوو کاك هیدایەت بوو بە ئەندامی یەکەم ئەنجومەنی نیشتمانی (١٩٨٠ - ١٩٨٤).

٨٥- ئەو ئاوارە بوونە لە (٢٠ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٠)وە تا حوزەیرانی ١٩٢١ی خایاند.

٨٦- جۆگە ئاوێك بەناو شاری کفریدا تێئەپەڕێ و بووەتە سنووری نێوان دوو گەرەکی (ئیسماعیل بەگ و سەیدەکان).

٨٧- بڕوانە: دور الشعب الکردي في ثورة العشرین، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد ١٩٧٨، ل ١٤٨، ئەویش لە ڕۆژنامەی (العراق)ی ژمارە ٣٠ی ئەیلول و ٧ ت/ ١٩٢٠.

٨٨- (عیسا عەبدولقادر) لە یەکەم دێری چامەکەیدا وتوویەتی الاهبوا رفاقي واستفیقوا وکونوا کلکم متعاضدینا (واتە: ئەی هەڤاڵەکانم ڕاپەڕن و ڕاستەوەبن و هەمووتان یەك بگرن و پاڵ بدەن بەیەکەوە). (محەمەد مەهدی بەسیر) شاعیرێکی نابینا بوو بە شاعیری شۆڕشی بیست ناوبانگی دەرکردبوو.

٨٩- (شمنگ باریك)و (هۆزتمان) نەوعە تفەنگێکی ئەو سەردەمە بوون، (جوامێر) یەکێك بوو لە سەرۆکە نەبەردەکانی هۆزی هەمەوەند، (داڵە مێن) ناوی چیایەکە (داڵ)یش پەلەوەرێکە بەلاشەی تۆپیو فێرە (پەلکەبران) واتە پرچرنین.

٩٠- حەلیمە کچی عەلی دەروێشی دەلۆیی ساڵی (١٩٤٧) لە تەمەنی نەوەت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، ئەم ئافرەتە لە شەڕی بەرگری هۆزەکەیدا چەند جارێك بەشداری کردووە.

٩١- لە چلەکانەوە (ئیبراهیم عەبدولباقی ١٩١٠) کوڕی نەعەنێر تا ڕۆژانی ئەمرۆ لە خانەقیدا دانیشتووەو پەیوەندی لەگەڵ خزمەکانیدا پاراستووە.

٩٢- بڕوانە: ڕۆژنامەی (العراق) ژمارە (٢١٠٦) ڕۆژی ٦ی کانوونی دووەمی ساڵی١٩٨٣ (نعیمة الثائرة البطلة) نووسینی بەخامەی نووسەری ئەم کتێبە.

٩٣- بڕوانە ابراهیم خان ثائر من کردستان، د. مکرم تاڵەبانی ١٩٧١، ل ٥٠.

٩٤- کردەوەی (مشیری حەمەی مام سلێمان) لە کردەوە چەپەڵەکەی (ئیڤاڵت)ی ئیسپراگی ئەچێت، سوپای ئێران کە چوونە سەر یۆنان پاڵەوانەکانی ئیسپراگە بەسێ سەد کەسەوە دەربەندی (ئەرمۆبیلی)یان لێ گرتن و زەبرو زەنگی دوژمن نەیانی ترساند بوو، بەڵام (ئیڤاڵت)ی ئیسپراگی دزە ڕێگەیەکی لەپشت قورگی دەربەندەکەوە پیشان دوژمندا ئەوانیش لەو کەلەبەرەوە کردیانە ئەودیوەوەو لە پشتەوە هەڵیان کوتایە سەر ڕۆڵە نەبەردەکانی ئیسپراگە، لەو شەڕەدا یەکێك لەو سێ سەد کەسە دەرنەچوو هەموویان کوژران و دوژمن بەسەر لاشەکەیاندا ڕێگەی یۆنامنی بۆ تەخت بوو، ناوی (ئیڤاڵت) لە مێژوودا بوو بە پەڵەیەکی ڕەش و نموونەی خیانەت کردن.

* ئەم بۆچوونی نووسەرە دەربارەی تێگەیشتنی ووشەکە، بەڵام خۆی لە بنەڕەتدا زۆر لەو مێژووە کۆنترە و لە بەرگی یەکەمدا زۆر بە درێژیی دەربارەی بنەڕەتی ناوەکە باسکراوە.

*** هەڵوێستی دانیشتووانی کەرکوك بەرامبەر بە ئاشووبی ١٤ی ئایاری ساڵی ١٩٢٤:-**

د. پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری
محەمەد باقی سەعید مستەفا

**ئاسووری (ئاشووری، نەستوری- (فەلە) لە عێراقدا بەتایبەت لە کەرکوك*:-**

ئاسوورییەکان کە لە ناوچەی چۆڵەمێرگ ودەوروبەری، لە کوردستانی باکورو رۆژهەڵاتدا ئەژیان، لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا، لەژێر فرمانی گەورە ئایینییەکەیاندابوو بەناوی (مار شەمعون)، دوای برانەوەی جەنگەکە وەك هەموو کەمە نەتەوایەتیو ئایینییەکانی کە هەستان وراپەرینو شۆرشیان بەرپاکرد داوای مافی نەتەوەیی خۆیان ئەکرد، بەهیوای رزگاربوونیان لە ژێردەستی تورك، دژی رژێمی تورکی ستەمکار وداگیرکەر وەستان، کۆمەڵێکی دیکەیان لە دەورویشتی ورمێ هەبوون، هەموو بەیەکەوە هەڵسان بۆ داواکاری مافیان، و بەریتانیا ویستی یارمەتیان بدات. پێش ئەوەی چەکیان پێبگات، هێزی تورك فریاکەوت هێرشی کوشتنی بەکۆمەڵ و خوێناوی هێنایە سەریان.

لە ئەنجامدا ئەم ئاشوورییانە لە تورکیاو ئێران تووشی کۆمەڵکوژیو رەوپێکردن وکێشەبوون، راپەرینەکانیان بۆ ئازادیو داواکاری و دەستکەوتی مافیان وەك نەتەوەیەکی کۆن سەرینەگرت. لە ورمێ کوشتاری زۆریان لێکردن بەمەبەستی و کۆمەڵکوژیو لەناوبردنی یەکجارییان ئەوەی مابوو فریاکەوتن بەرەو کوردستانی خواروو هەڵهاتن. ئینگلیز بەهانایانەوە هات یارمەتیدان لەناو عێراقدا لە زۆر شوێن نیشتەجێیکردن فریایان کەوت یارمەتیدان و گوێزرانەوە بۆلای راستی رووباری دیالە نزیك بەعقوبە (باخقوباد) لەناو چادردا نیشتەجێکران کە ژمارەیان نزیکەی پەنجا هەزار ئاوارەبوون، لەوانە سیازدە هەزارو پێنج سەدیان ئەرمەنی بوون. لەدوای برانەوەی جەنگی جیهانی یەکەم، ئەوانەی لە کوردستانی رۆژهەڵاتەوە (ئێران) ئاوارەبوون گەرانەوە شوێنی خۆیان لە گەرانەوەیاندا بۆ ناو ئێران رێگریان لێنەکرا. بەریتانیا جێگە گۆرکێی و ئالوگۆریو پێنەکردن، ژمارەیەکی زۆر لەلاوانی ئاشووری وەك سەرباز وەرگرت بەناوی (لیڤییەوە) بەکاری ئەهێنان بەمەبەستی تایبەتی خۆیان (بۆبەرژەوەندی بەریتانیا) کەلە کەرکوك و دەوروبەیدا زۆریان کۆکرابوونەوە دانرابوون.

کۆمەڵێك لەو لیڤییانەی کە لەناو لەشکری بەریتانیدا هەبوون لەناو کەرکوکدا کاریان ئەکرد ژیانیان بەسەر ئەبرد، لە رۆژی ١٤ چواردەی مایسی ساڵی (١٩٢٤)دا، لە ئەنجامی هەندێك هۆ وتێنەگەیشتن لەیەکتر و دەمەقاڵێ لەگەڵ دانیشتووانی کەرکوکدا، سەربازە ئاشوورییەکان هێرشیان کردەسەر دانیشتووانی بێچەکی ناو کەرکوك لە ئەنجامدا پەنجاوشەش (٥٦) کەسیان لێکوشتنو (٤٤) چلوچوار کەسیشیان بریندارکرد، لە تۆڵەی ئەم کوشتارەدا کەرکوکییەکان ویستیان تۆڵە بکەنەوە بەڵام بەریتانیا خێرا فریاکەوت گوێزرانەوە بۆ چەمچەماڵ.

بۆ سبەینێ هەر لە تۆڵەی ئەو کوشتارەدا دانیشتووانی کەرکوك هێرشیان هێنا بۆ سەر گەرەکی کۆنی مەسیحییە کلدانییەکانماڵەکانیان تاڵانکرد، هەندێکیان لێکوشتن، کە تا ئەوکاتەش کەرکوك لە ژێر حوکمی ئینگلیزدابوو. ئەوانەی لە شوێنە کوردنشینەکانی کوردستانی باکوورەوە هاتبوون (تورکیا)، بوونە کێشەیەك بۆ بەریتانیا، تورك رێگر بوو لە بەردەم گەرانەوەیاندا بۆزێدی باوباپیریان، بوونە بارێك بەسەر ئینگلیزەوە دوایی نیازیانبوو هەندێك دێهاتی سەرو موسڵ لە خاوەنە کوردەکانیان بسێنن پێیان بدەن لەوێ نیشتەجێیان بکەن کە ئەکەوتە سەرو ئامێدی بەتایبەت لەدێی (مای).

رووداو یاخود ئاشووب (فیتنەی)ی مانگی (ئایاری ساڵی ١٩٢٤)ی شاری کەرکوك لەنێوان هێزی (لیڤی)[1] ئاشووریو دانیشتووانی شارەکەدا، لە دەرئەنجامی کۆمەڵێك فاکتەری راستەوخۆو ناراستەوخۆ هەڵایسا، کە لێرەدا هەوڵدەرێت هەریەکەیان بەجیا باس بکرێت:-

یەکەم:- فاکتەرە ناراستەوخۆکان:

لە گرنگترین ئەو هۆکارە ناراستەوخۆیانەی، کە بوونە بنچینە بۆ هەڵایسانی فیتنەی شاری کەرکوك ئەمانەن:-

أ- فاکتەری ئاینی:-

هەندێك لە مێژوونووسان هۆکاری ئەم ئاشووبە دەبەنەوە بۆ"سۆزی ئایینی" (ئەلمار) لەم بارەیەوە نووسیویەتی "زۆر سانایەکە سۆزداری ئایینی لەگەڵ یاداشتەکانی جەنگو کەمو کورتییەکانی رابردوو تێکەڵ بێت، هەر ئەمەش ببێتە هۆی هەڵایسانی ئاگری دەروونی لە بارەی هەر ململانێیەکی بێماناو سنووردار، ئەمەش لەنێوانی ئاشووریو عێراقییەکان رێگەی بەرەو کوشتاری چەکداری گرت"[2] لە موسڵو کەرکوك.

ب- فاکتاری نەتەوەیی:

هۆکارەکان هەرچیەك بێت لە پشتی ئەم رووداوە ئەوا توێژەر ناتوانێت فاکتەری نەتەوەیی فەرامۆش بکات، لەگەڵ ئەو بارودۆخەی کە لەو سەردەمەدا هەبووەو لە ئەنجامی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە کەوتبوونەوە، وەك رۆڵی راگەیاندنو بانگەشەی لایەنە شەرکەرەکان کە کاریگەری لە دەروونی نەتەوە جیاوازەکانی شارەکەدا دروستکردبوو. بۆ نموونە عوسمانییەکان لە پێش جەنگداو لە جەنگیشدا چاکەی تورکمانیان دەدا بەسەر نەتەوەکانی دیکەی شاری کەرکوکدا، ئەمەش بەهۆی ئەوەی، کە زمانو رەگەزی هاوبەشیان هەیەو لەبەرئەوەش تورکمانیان بە حاکمی شارەزای نێوچەکە دەزانیو هیچ بەرامبەریان نییە، بەڵام بەشکاندنی عوسمانییەکان لە جەنگدا ئەم هاوسەنگییە دژی تورکەکان کەوتەوە، بەوپێیەی سوپای (لیڤی) ئاسوری رۆڵیان لەو جەنگەدا لە دژی عوسمانیو تورکەکان بینی بوو[3]. بەریتانییەکان پشتگیری ئاسوورییەکانیان کردو بۆ بەشێکی

سوپای (لیڤی) لە کەرکوك، ئۆردوگایەکیان دامەزراند، کە حەزیان لە تورکمانە هاوزمانو هاورەگەزەکانی تورکدا نەدەکرد کە ئارەزوویان بەگەڕانەوەی دەسەڵاتی تورك دەکرد، لەلایەکی دیکەوە تورکمانە کانیش لە ئاسورییەکان بە گومان کەوتبوون، چونکە ئینگلیزەکان لە وتووێژی یەکلاکردنەوەی چارەنووسی (ویلایەتی موسڵ)دا، ئاسورییەکانیان وەك کارتی گوشار بۆسەر تورکیا بەکاردەهێنا، لەبەرئەوە کەرکوك بەهۆی ئەم نەتەوە ناکۆکانەوە شێواوییەکی زۆری بەخۆوە بینی بوو و هەر ڕووداوێکی بچووك لێی ڕادەبسترا بقڵیشێتەوە[٤].

(ئاسورییەکانی) کەرکوکیش بە حوکمی ئەوەی کاری خراپو ترسناکیان لەگەڵ ڕۆشنبیرانو خوێندەواری تورکمانو شارەکەدا ئەنجامدەدا بەفیتی داگیرکەرانی کەرکوك، ئەمەش بووە هۆی ئاشووب لە شارەکەدا[٥].

(ق.ب. ماتفییق – مارمتی) ئەو ئاشووبەی کەرکوك دەگێڕێتەوە بۆ تێکدانی پێوەندی نێوان نەتەوە جیاکانی شارەکە، لەم بارەیەوە دەڵێت: سەرجەم دەسەڵاتدارانی عێراق بەجیاکردنەوەی (ڕەفعەت پاشا)ی موتەسەڕیفی ڕابردووی موسڵ، کە ئەو تێبینییەکی قورسی هەبوو لەسەر مەسەلەی ئاشوورییەکانو لەپێناو یەکێتی نیشتمانی لەنێوان سەرجەم نەتەوەکانی عێراقدا تێدەکۆشا، بەڵام دەسەڵاتدارانی دیکە بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە ئاگری ئاشووب لەنێوان نەتەوەکاندا داگیرسێنن[٦]. ئەم سیاسەتە بۆ شاری کەرکوکیش هەروابووە.

ج- فاکتەری بیانی (دەرەکیی):

سەرباری ئەوەی کە لە کەرکوکدا کۆمەڵێکی زۆرکەمە نەتەوە بەدرێژایی مێژوو لە پاڵ نەتەوەی کورددا ژیاون، بەڵام ناتوانرێت بەبەڵگە هیچ کارەکتەرێکی توندو تیژی لەنێوانیاندا دیاری بکرێت کەڕوویدابێت. بەپێچەوانەوە بەدرێژایی سەدەی بیستەمو پێشووتریش پێوەندیەکی زۆر بەهێز لەنێوان ئەم نەتەوانەدا هەبووە، تەنها دوو پێکدادان ڕوویداوە، کە ئەویش بە دەستی بیانی پیلانی بۆ دارێژراوە[٧].

ڕووداوی کەرکوك لەدایکبووی ئەوپێکهاتنەبوو کە لەنێوان ئینگلیزو ئاسورییەکاندا کەوتبووەوە، ئەوەی جەخت لەسەر ئەمە دەکاتەوە ئەوبەیانەبوو کە (مەندوبی سامی) لە ڕۆژی (٣١ی ئایاری ١٩٢٤)دا دەریکرد، ئەمەی خوارەوە دەقەکەیەتی: حکومەتی بەریتانی ماوەیەکە زۆر بە پەرۆشەوە گرنگی بابەتی کێشەی پارێزگاری کردن لە بەرژەوەندییەکانی گەلی ئاشووری دەڕوانێتو خستویەتییە ژێر چاودێرییەوە، سەرجەم ئەو خزمەتانەی، کە پێشکەشی هاوپەیمانانیان کردووە لە جەنگی گەورەداو پێوەندیان بەداهاتووی دەوڵەتی عێراقەوە هەیە، بۆیە بریارمانداوە، کە هەوڵبدەین سنووریان درێژبکەینەوە بۆ درێژترین سنوور، کە لە تواناداە بێت بۆ باکوور، بۆ ئەوەی، کە زۆرترین نەتەوەی ئاشووری بگرێتەوە، کە بەشی زۆرینەی ئاشووری تێدایە، ئەمەش جگە لەوانەی کە لەو نێوچانەدا مردوونو سەر بە حکومەتی ئێرانن. هیواشمان وایە، کە ئەو چیایانەی کە تەیارییەکانو هۆزەکانی (توخوما، ئەلجیلۆ، باز)ی تێدا نیشتەجێن بچنە نێو ئەم سنوورەوە لە دەوڵەتی عێراقیدا ڕێکبخرێن، ئەمەش نەك بەهۆی ئەوانەی کە مردوون لەو نێوچانەدا بەتەنها بەڵکو جگە لەوانەش ئەو ئاشوورییە ئێرانیانەی کەنیشتمانیان ئێران نییە، خاوەن شکۆ" مەندوبی سامی" جەختی لەسەر ئەوەش کردوە کە چەند نێوچەیەکی بۆش هەیە کە زۆر پێویستە پێیانو ودەشچێتە نێو زەوی زاری عێراقەوە، کە (دهۆك، ئامێدی، چیای باکوورییەکان) دەگرێتەوە. دەکرێت ئەو ئاشوورییانەی کەباسکران لەم کۆتایانەدا بۆ هەتا هەتایە تێدا نیشتەجێ بن لە پاش ئەوەی کە حکومەتی ئینگلیز بڕیاریدا کە ئەم سیاسەتە باشترین شتێکە کە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی ئاشوورییەکانو دەوڵەتیش بکات لەگەڵ یەکدا، حکومەتی عێراقی بانگێشت کرد بۆ ئەوەی، کە چەند دڵنیاییەکی پێویست لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە دەرببڕێت وەك گەرەنتیەك بۆ سەرکەوتنی ئەو سیاسەتە:-

١- حکومەتی عێراقی بۆ هەریەکێ لەو ئاشوورییانەی بەو شێوە نوێیە نیشتەجێدەبنو سەرجەم ئاشوورییەکان، لە نێوچەی (تەیارییە، توخویە، باز، جیلۆ) مردوون، (ئەگەر ئەم وڵاتە لە حکومەتی تورکی بسێندرێتەوەو بدرێتەوە عێراق) بەشێکی زۆر ئازادی لە بەڕێوبردنی نێوچەکانی خۆیاندا پێببەخشێ، وەك هەڵبژاردنی کوێخای گوندەکانیانو گرتنەبەری چەند ئامارژەیەکی پێویست لە هەریەکێك لە گوندەکان، بۆ کۆکردنەوەی ئەو باجانەی کە حکومەتی عێراقی دایناوە ببەخشێت.

٢- حکومەتی عێراقی ئەو زەوییە بۆشەی، لە سەرەوە کە باسکراون بەبێ هیچ نرخو مەرجێکی دیاریکرا بیداتە ئاشوورییەکان. حکومەتی عێراقیش ئەم دوو گەرەنتییەی داوەو ئێستاش لەسەر سنوور، دانوستان دەکات حکومەتی بەریتانیاش دڵنیایەکە بەزووترین کات ئەوسیاسەتەی کەپلانی بۆ کێشراوە جێبەجێدەکرێت بەشێوەیەکی کۆتایی، ئەوەش گەرەنتی ئەوە دەکات کە ئاشوورییەکان نێوچەیەکی گونجاو فراوانیان هەبێت بۆ نیشتەجێبوونو ئازادبن لە چارەسەرکردنی کاروبارە نێوخۆییەکانیاندا...

٣١ ئایاری ساڵی ١٩٢٤[٨].

ئەم بەیانەی (مەندوبی سامی)ئەوە بە دەردەخات کە ئەو ڕووداوەی کەرکوك بەشێك بووبێ لە پلانی ئینگلیزەکان، بەمەبەستی ئەوەی، کە بزانن توانای هێزی "لیڤی" ئاسوریو کاریگەری ئەوان لەسەر تیرۆری دانیشتووان چەندە، بۆشیان ڕوون بێتەوە کە ئایا ئەوان دەتوانن هەستن بەبەکارهێنانی ئەم هێزە لە کاتی پێویستدا بۆ هەموو ئەو ڕێگرییانەی لە داهاتووی عێراقدا، کە دێنە پێشیان[٩].

دامەزراندنی دەوڵەتی ئاشووری لە باشووری کوردستاندا:

یەکێك لە هۆکارەکانی دیکە لە ئاشووبی کەرکوك ئەو دەنگوباسانەبوون، کە گوایە (ئینگلیزو فەرەنسا)نیازیان هەیە باکووری عێراق" باشووری کوردستان" بدەن بە ئاشوورییەکان[١٠].

مەسیحییەکانی ئەم نێوچەیەش بە هاوکاری فەرەنسییەکان داوای دامەزراندنی دەوڵەتی خۆیان دەکرد، لەوسەردەمەدا پەرتوکێکیان وەك بەڵگەنامە بڵاوکردەوە

لەژێر نێوی (مەسەلەی ئاشووری - کلدانی لە ساڵی ١٩٢٠-١٩٢١)دا ئەم پەرتوکە نیوەی لاپەرەکانی پیادا هەڵدانبوو بە فەرەنساو مەنداتی فەرەنسیداو بە حوکمی دیموکراتی فەرەنساو پاڵپشتیکردنی بۆگەلانی نێوچەکە، ئەم کتێبە بەزمانی فەرەنسی لەلایەن (جۆرج دویرا) نێوێکەوە نووسرابوو... هەر لە پێشەکێکەیدا ئەو پێشنیارەی (جەنەراڵ غۆرۆی) مەندوبی سامی فەرەنسا لە سوریاو لوبناندا بڵاوکردبۆوە، کە داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی (ئاشووری - کلدانی) کردبوو. کە دەروازەی ئەو دەوڵەتەش بەندەری ئەسکەندەروونە بێتو هەموو ویلایەتی موسڵیش بگرێتەوە[11].

هـ- فاکتەری سیاسی: سزانەدانی ئەو ئاسورییانەی کە هەستابوون بە ئەنجامدانی رووداو (فیتنە)ی موسڵ[12].

هاندەرێك بوو بۆ دووبارە بوونەوەی ئاشووبێك لە کەرکوك لەلایەن (لیڤی)ە ئاسورییەکانەوە، کە ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتووانی ئەوشارەیان کوشت[13].

جگە لەمەش هەر لەشاری کەرکوکەوە هێزی (لیڤی) ئاسوری بۆ بەرژەندییەکانی بەریتانیا زۆر بەنا جۆری دژی جوڵانەوەکانی (شێخ مەحمود) بۆ دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردی شەریان دەکرد[14].

دووەم:

فاکتەری راستەخۆ:-

بۆ رووداوە (ئاشووب)ی (٤ی ئایاری ١٩٢٤)ی کەرکوك، دەگەرێتەوە بۆ ئەو دەمەقاڵەیەی لەنێوان دووسەربازی (لیڤی) ئاسوریو دوکاندارێکی تورکمانی بازاری کەرکوکدا[15]. لەسەر نرخی شمەك[16]، کە دواتر ئەمە تەشەنەی سەندو بووە پێکدادانی خوێناوی[17]، بەڵام (م. بێستون عەلی کەریم عەزیز) لەم بارەیەوە دەڵێت: سەرەتای ئاشووبی کەرکوك لەیەکێك لە چایخانەکانی شارەوە دەستی پێکرد، لەسەر یاری دۆمینە کە لەنێوان سەربازێکی لیڤیو کابرایەکی دووکانداری تورکمانی شارەکەدابوو[18].

(جەرجیس فەتحوڵڵا) نووسیویەتی: لەبەرەبەیانی ٤ی ئایاری ساڵی ١٩٢٤دا دوو سەربازی سوپای لیڤی دابەزینە نێو بازار بۆ کرینی پێداویستییەکانیانو سەرئەنجام دەنگە دەنگ لەنێوان ئەوانو فرۆشیارێکی تورکمانیدا دروست بوو، ئەمە گۆرا بۆ پەلاماردانی یەکتریو ژمارەیەکیش لەو کەسانەی لەوێبوون هاوکاری دووکاندارەکەیان کرد. ئەمەش لە دەرئەنجامی چەند زاراوەیەکی ناشیاودا روویدا، بەتایبەتی لەو زاراوانەی کە ئاگر دروستدەکات لە خوێنی رۆژهەڵاتییەکاندا، لە کاتێکدا کە ئەم وشانە دەوترێت هیچ کەسێك ناتوانێت پەسەندی بکاتو خۆی بگرێت... لەوشایەدانەی کە گەواهیان دا لەبەردەم (کۆمەڵەی سەربازی) دا کە تاوانبارانی تێدا دادگای دەکران، سەربازبوونو تورکمانەکان گوێ بیستی چەند زاراوەیەکی وەك (ئەچین بۆ شەر... ئەوکاتە ئەوە.... بەژنەکانتان دەکەین) لەگەڵ چەند ئیشارەتێك بەدەستو چەند ئەندامێکی تردا کە ئاماژەیان بۆ دەکرد)، ئەمەش لەراستیدا سەرەتایەك نەبوو بەڵکو کۆکەرەوەیەکی سەرجەم ئەو رقانەبوو کە هەر لەسەرەتای پێخستنە نێوەوەی ئەم کەسانەوە بۆ کەرکوك دروست ببوو کە بە ئارەزووی خۆیان بەرێگەکانی شاردا دەرۆیشتنو نوێنەرایەتی دەسەڵاتی پراکتیکی هێزی داگیرکەری ناخۆشەویستیان دەکرد[19].

چۆنییەتی راستی رۆژی رووداوەکەش بەشێوەیەکی جیاواز باسی لێوەکراوە، ئەم جیاوازیانەش لەنێو نووسەراندا دەگەرێتەوە بۆ جیاوازی نەتەوەییو ئایینی تارادەیەك مەزهەبیش، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئاشووب (فیتنە)کەی مانگی (٤ی ئایاری ١٩٢٤) لە کەرکوك، بەم شێوە بوو:-

لەکاتێکدا دووسەربازی هێزی (لیڤی) ئاسوری خەریکی کرینی پێداویستییەکانیان بوون لە بازاری (قۆریە)ی کەرکوکدا، لەگەڵ یەکێك لە دووکاندارە تورکمانەکانی بازارەکەدا دەمەقاڵەیان دەبێتو دواتر دەبێتە شەریانو یەکێك لەسەربازە (لیڤی)یەکان برینداردەبێت[20].

پاش ئەوەی کە بەبرینداری بۆ بارەگاکەیان دەگەرێتەوەو کار دەکاتە سەرهەستی هاورێکانیو هانیاندەدا بۆ تۆڵەکردنەوە لە دووکاندارەکان، بۆ ئەم مەبەستەش دوو تیپ لە هێزی (لیڤی) ئاسوری کەبارەگاکانیان لەنێو کەرکوکدابوو، سوربوون لەسەر تۆڵەسەندنەوەی هاورێکانیان[21].

بۆیە هەرچی ئامێری کوشتارو جەنگیان هەبوو هەڵییان گرتو بە هێزێکی زۆرەوە چوونە دەرەوەو دابەشبوون بەسەر رێگەکانی شارداو هەرکەسێکیان ببینایە تەقەیان لێ دەکرد (ئەو رۆژەش شار قەرەباڵغ بوو بە هۆی نزیك بوونەوەی جەژنی رەمەزانەوە)[22]. لەگەڵ ئەوەشدا دزیو تاڵانیان لە هەندێك لە دووکانو ماڵەکان کرد[23]. لەوکاتەدا دووپۆلیس[24] رووبەروویان بوونەوە تاکو بیانگێرنەوەو وازیان پێبهێنن لە تەقەکردن، بەڵام هێزی لیڤییەکان ئەو دوو پۆلیسەیان کوشت. (موراد بەگی رەحمەتوڵڵا موبارەك)ی بەرێوەبەری پۆلیسی کەرکوك لەسەرداوای ئەفسەرێکی بەریتانی سەرجەم هێزی پۆلیسی لە بازاردا پاشەکشەی پێکرد بۆ بنکەکانیانو نەشێهێت بچنەوە بازار بۆ پارێزگاری کردن لە خەڵکی شارەکە[25]. هێزەکانی (لیڤی) درێژەیان بەکارە توندو تیژییەکانی خۆیانداو هێرشیانکردە سەر مزگەوتو گەرماوی (ئەحمەد ئاغا)[26]. کە لەو کاتەدا تایبەت بوو بە ئافرەتان، بەڵام (عەلی بەستی مەنمی) پارێزگاری لە گەرماوەکە دەکاتو ناهێڵێت لیڤیەکان بچنە گەرماوەکەوە[27].

لێرەوە هێزی (لیڤی) ئاسورییەکان بوونەوە، شەروکوشتار تا ئێوارەی ئەو رۆژە درێژەی کێشاو سەر لە ئێوارەش لیڤیەکان پەنایان بردە بەرماڵە (مەسیحی)یەکانی شارەکە لەبەرئەوە هاو ئاین بوو[28].

لەلایەکی دیکەشەوە هەندێك لەپیاوانی هۆزی رۆژبەیانی لەلای بنەماڵەی (ساڵح گوڵخان) کە پاسەوانو شوان بوون توانیان (تەیارییەکان)ی نزیك (منار نەخشینە) ناچاربکەن، کەشوێنەکانیان بە جێبهێڵن[29].

رۆژی دواتر تورکمانو بەشێك لە خەڵکی شارەکە هێرشیان کردەسەر ئەو ماڵە مەسیحییانەی، کە داڵدەی زۆرێك لە سەربازەکانی (لیڤی) ئاسوریان دابوو، هەندێکیان لێکوشتنو ماڵەکانیان تاڵانکردن[30].

(جەرجیس فەتحوڵڵا) لەم بارەیەوە دەڵێت: ئەوەی کە سەرچاوە عێراقییەکان لێی بێدەنگبوون و بەیەك پێتیش باسیان لێوەنەکردووە ئەوەیە، کە چەند لایەنێك لە دانیشتووانی چەکداری بێسەرو بەرهەستان بە تۆڵە سەندنەوەی خۆیان لە ڕۆژی دواتردا هێرشیان کردە سەرگەڕەکی (مەسیحییە کلدانییە کۆنەکان) و ماڵەکانیان دزین و بە دەیەهاشیان لێکوشتن[٣١]. چەند سەد مەسیحییەکیش بۆ پاراستنی گیانیان پەنایان بردە قەڵای کەرکوك کە بارەگای پشکینەری بەڕێوەبەرایەتی کەرکوك کە (ئاتن مللر)ی لێبوو[٣٢].

لە ئێوارەی (٥ی ئایاری ساڵی ١٩٢٤)دا (هێزی چەکداری بەریتانی لە عێراق) بۆ ئاسایی کردنەوەی بارودۆخەکەوە پارێزگاری ژیانی مەسیحییەکانی شارەکە، بە فرۆکە (مەندوبی سامی) و هێزێکی نوێ کە پێکهاتبوو لە لەشکری سوپای (ئینسکتینگ – Iniskilling) پادشایەتی گەیاندە شاری کەرکوك[٣٣].

بەگەیشتنی (مەندوبی سامی) بەریتانی بەیانێکی بەزمانی تورکی بۆ دانیشتووانی کەرکوك بڵاوکردەوە و تێدا بەڵێنیدا کە سزای هەموو ئەوانە بدات کە ڕووداوەکەیان بەسەردا دەسەپێت لە سەربازانی (لیڤی) ئاسوری، قەرەبووی هەموو زیان لێکەوتووانیش دەکاتەوە. ئەمەش دەقی بەیانەکەیەتی:-

"بەوکارە ساتە زۆر زۆر کاریگەربووین کە نیوەڕۆی دوێنێ ڕوویدا، هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە بڕیاردراوە بە ڕۆیشتنی سوپای ئاشووریەکان لە کەرکوك بۆ جێگەیەکی دوور، هەروەك ئێستاش لەلایەن ئەفسەرە بەریتانییە هەڵبژێردراوەکانەوە بەشێوەیەکی تایبەتی لێکۆڵینەوە لەو ڕووداوە دەکرێت، بەڵێنیش دەدەین بە دانیشتووانی کەرکوك نەگەڕێت و تەنها یەك کەس لەوانە کێشەکە بشکێتەوە بەسەریدا کەمتەرخەم نابین لەوەی، کە سزایی یەکلاکەرەوە بدەین بەسەریدا هەروەها قەرەبووی ئەو زیانانەش دەکەینەوە، کە لێتان کەوتووە...

٥ی مایسی ساڵی ١٩٢٤
مەندوبی سامی هـ دوبس[٣٤].

بەدەرکردنی بەیانەکەی مەندوبی سامی (هنری دوبس) بارودۆخەکە ئاسایی نەبووەوە، لەبەرئەوەی هۆزو خێڵە کوردییەکانی دەورووبەری کەرکوك بەبیستنی هەواڵی شەڕوپێکدادانی نێوان هێزی (لیڤی) ئاسوری و تورکمانەکان و بەبیستنی ئەو هەواڵەی کە زیاتر لە (٥٦)ی تیا کوژراو (١١٠) برینداری[٣٥]. لە دانیشتووانی کەرکوك هەیە[٣٦]. کۆبوونەوەو هەوڵیاندا بۆ هاریکاری تورکمانەکان و خەڵکی شارەکە بچینە نێو شارەکەوە، [٣٧].

بۆ نموونە (شێخ مەحمود) زۆر بەپەرۆشەوە هەوڵیداوە دەیویست لە تۆڵەی ئەوکارەساتەدا (لیڤی)یەکان لە شارەکەدا دەربکات ونەیانهێڵێت[٣٨]. بەڵام هێزی بەریتانی ڕێی لە چوونە ژوورەوەی کوردەکان بۆ نێو شارەکە گرت[٣٩]. لەبەرئەوەی هەوڵی هێمنکردنەوەی بارودۆخەکەو پەردەپۆشکردنی ڕووداوەکانی دەکرد.

کاتێکیش شەوداهات ئینگلیزەکان توانیان هێزی تەیاری (لیڤی)ەکان و دانیشتووانی مەسیحی و جوولەکەکانی نێوقەڵای کەرکوك بگوێزنەوە بۆ دەرەوەی قەڵاکە، وەك گواستنەوەی هێزی (لیڤی) ئاسورییەکان بۆ نێوچەی (بانی مەقان)ی سەر ڕێگەی نێوان (کەرکوك – سلێمانی)[٤٠].

لەلایەکی دیکەوە (مەندوبی سامی) بەریتانی هەستا بەلادانی (فەتاح بەگ)ی موتەسەریفی کەرکوك و دانانی (عەبدولمەجید یەعقوبی) لە جێگەی[٤١]. لەبەرئەوەی ئەم کەسایەتییە کوردییە هەوڵی زۆری دابوو بۆ ئاسایی کردنەوە بارودۆخی شارەکە[٤٢].

لەگەڵ ئەوەشدا (٣٠) هەزار ڕوپێشی دایە (عەبدوڵڵا ساف) برای یەعقوبی تا بەسەر زەرەرمەندان دابەشی بکات، بەڵام ئەونیوەی دابەشکرد[٤٣]. ئەمەش نارەزاییەکی توندی لە نێو خەڵکی بازاڕو سادەی شاردا دروستکرد[٤٤]. بۆ لێکۆڵینەوەش لە ڕووداوەکە لیژنەیەك کە لە (مستەر دواریسن)ی ڕاوێژکاری قەزایی پشتپێبەستراوی مەندوبی سامی و ئەفسەرێکی هێزی فرۆکەوانی پێکهێنراو سەردانی شوێنی ڕووداوەکەیانکرد، بەڵام ئەم لیژنەیە نەیتوانی تاوانی کوشتن بخاتە سەر هیچ سەربازێکی لیڤی[٤٥].

ئەمەش وای لە حکومەتی عێراقی و دانیشتووانەکەی بەگشتی کرد، کە بەڵێنەکانی (مەندوبی سامی) بە ڕووکەش دابنێن[٤٦].

سەرۆك وەزیرانی عێراق (جەعفەر عەسکەری) بەیانێکی لەبارەی ڕووداوەکەوە بڵاوکردەوەو تێیدا دڵتەنگی خۆی دەربڕی و ئەوەشی ڕاگەیاند کەلێکۆڵینەوە بەردەوامە، حکومەتی عێراقیش بڕیاریداوە، کە باشترین ڕێگە بگرێتەبەر بۆ سزادانی ئەنجامدەرانی و دادگایی کردنی تاوانباران بەپێی یاسای عێراقی[٤٧].

جەماوەری عێراق بەگشتی و کەرکوك بەتایبەتی، کەوتنە داواکردنی ئەوەی کە هێزەکانی (لیڤی) ئاسوری بۆ (هیند) بنێردرێنەوە لە جێگەیانداو پشت ببەسترێ بە سوپای عێراقی[٤٨].

ئەمەش بووە هۆی گرنگی پێدانی لەلای حکومەتی عێراقی و لە ڕۆژی ٩ی ئایاری ١٩٢٤دا ئەنجومەنی وەزیران بەسەرۆکایەتی (مەلیك فەیسەڵ) کۆبووەوەو بڕیاریان لەسەر ئەمانەدا:-

١- دابینکردنی "٠٠٠، ٣٠"[٤٩]. ڕوپیە بۆ قەرەبووکردنەوەی دانیشتووانی زەرەرمەندی ڕووداوەکەی کەرکوك

٢- چاوخشانەوە بە پشتگیری و بەڵێنەکانی (مەندوبی سامی) لەپێناوی دروستکردنی هێزێکی نێوخۆیی، کە شوێنی هێزی (لیڤی) ئاسورییەکانی لە عێراقدا گرتەوە، ئەم کارەش لە ماوەی ساڵێکداو بەشێوەیەکی قۆناغبەندی بکرێ، ئابووری ئامادەکراویش بۆ دابین بکرێت.

٣- بەڕێوەبردنی لیوای کەرکوك وەك بەڕێوەبردنی لیواکانی دیکەی عێراقی لێبکرێت[٥٠].

ڕۆژنامەکانی عێراقیش خۆشحاڵیان بەو کۆبوونەوەیەی (ئەنجومەنی وەزیران) و بڕیارەکانی سەرۆك وەزیران (جەعفەر عەسکەری) دەربڕی، بەو گرنگیپێدانەی بە سەربازگرتنی

کەداویەتی، بۆ نموونە رۆژنامەی (العراق) وتارێکی نووسیوەو تێیدا باس لەوە دەکات، کە عێراقییەکان پێویستە دەست بە هەستە نیشتمانیی و نەتەوەییەکانیانەوە بگرن، ئەوشی روون کردۆتەوە، کە عێراق خاوەنی سوپایەکی بە هێزی خۆی نەبێت ناتوانێت داوای مافە لەدەست چووەکانی بکاتەوە[٥١].

ئەم جۆرە وتارانە لە چەندین رۆژنامەی دیکەی ئەو سەردەمەدا بڵاوکراونەتەوە. دوای چەند رۆژێك لە کۆبوونەوەکانی (ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق)، (ئەنجومەنی دامەزرێنەری عێراق) کۆبوونەوەیەکی تایبەتی لە رۆژی "١٥ی ئایاری ساڵی ١٩٢٤" بۆ رووداوەکەی کەرکوك سازدا، تێیدا ئەندامانی ئەنجومەن داواکارییەکیان دایە سەرۆکی ئەنجومەن (عەبدولموحسن سەعدون)و تێیدا داوایانکردبوو کە (حکومەت پێویستە راستی رووداوەکەیان بۆ روون بکاتەوە، لەگەڵ هۆکاری رووداوەکەو ئەوکارانەشی، کە کراون بۆی)[٥٢].

لەسەر داواکاری ئەندامانی ئەنجوومەن سەرۆك وەزیران (جەعفەر عەسکەری) رووداوەکەی کەرکوکی بەشێوەیەکی چڕ روونکردەوەو جەختی لەسەر سزادانی تاوانبارانی رووداوەکە بەتووندترین سزاکردەوە[٥٣].

پاش ئەویش " ئەندامانی ئەنجومەنی دامەزرێنەر" کەوتنە توێژکردن لە رووداوەکەوە نوێنەرانی کەرکوك لە ئەنجوومەنی دامەزرێنەر" ئەوەیان روونکردەوە کە تووندرەوی هێزی ئاسوری هیچ وێنایەکی نییە هەروەك چۆن هیچ وێنایەکیشی نەبووە لە عێراقدا، داوایان کرد، کە پێویستە یاسا جێبەجێبکرێت و ئاسایش دابین بکرێتەوە لە کەرکوکدا[٥٤].

نوێنەری بەغداد (شێخ ئەحمەد داود) وتی: ئەو سەربازە لیڤیانەی کارەکانیان نامرۆڤانەو خوێنرێژانەیە، جەختیشی لەسەر ئەوە کردەوە کە پێویستە لە عێراق دەرکرێن، وتیشی گەلی عێراق ناتوانێت پارێزگاری لە خۆی بکات ئەگەر بە کۆمەڵێکی پڕ چەك دەورە درابێت...

رەخنەشی لە حکومەت گرت کە رێگەیان بۆ ئاسان کردووەو کەم تەرخەمیش بوون لە بارەیانەوە[٥٥].

نوێنەری هەولێر (موحەمەد شەریف) لە بارەی رووداوەکەی کەرکوکەوە وتی:" دڵتەنگیی و پێناخۆش بوون هیچ سوودناگەیەنێ لە پاش رووداوەکەی کەرکوکدا، داوای کرد کە گەلی عێراق ئەمە ببێت بە پەند بۆیان و روونی کردەوە کە گرنگی نەدان بەرووداوەکەی موسڵ، بووە هۆی ئەوەی کە لە کەرکوك دووبارە ببێتەوە، حکومەتیشی ئاگادارکردەوە کە پێویستە چەند رێگەو شوێنێکی پێویست بگرێتە بەر بۆ بەدەستهێنانی دادپەروەری، کە لە داهاتوودا لە هەر رووداوێکی هاوشێوەی کەرکوك رێگربن"[٥٦].

(فەتحوڵڵا سەرسام)ی نوێنەری"موسڵ" بەنێوی مەسیحییەکانی عێراقەوە دڵتەنگی خۆی دەربڕیی و کاربەدەستانی "لیڤی" ئاسوری بەتاوانباری سەرەکی رووداوەکەی کەرکوك و کوشتنی چەند مەسیحییەکی نێو کەرکوك داناوە، بەنێوی مەسیحییەکانەوە لە عێراق سوپاسی دانیشتووانی موسڵمانی کرد، لەسەر ئەو سۆزە پیرۆزەی کە هەیانەو پێی جیادەکرێنەوە لە خەڵکانی دیکە، داواشی لە حکومەت کرد کە سزای ئەوانە بدات کە کردەوەکەیان بەبێ بەزەیی ئەنجامداوەو چەند رێگەو شوێنێکی کاریگەر بگرێتەبەر بۆ دووبارە نەبوونەوەی ئەم رووداوانە لە داهاتوودا[٥٧].

بەم شێوەیە (ئەنجومەنی دامەزرێنەر) کۆبوونەوەی دوازدەهەمی خۆی کۆتایی پێهێنا، کە زۆر بەتووندی دژی رووداوەکەی (٤ی ئایاری ساڵی ١٩٢٤) وەستایەوەو داوای دامەزراندنی دادگای تایبەتی بۆکرد. سەرئەنجامی نارەزایی و داواکارییەکانی (ئەنجومەنی وەزیران)و (ئەنجومەنی دامەزرێنەر)و ئەو فشارە زۆرەی، کە دانیشتووانی عێراق بەگشتی و کەرکوك بەتایبەتی دروستیانکردبوو، دادگایەکی تایبەتی بۆ دادگایی کردنی تاوانبارانی رووداوەکەی (کەرکوك) دروستکرا. کە پێکهاتبوو لە (مستەر بریتشارد) سەرۆکی دادگای سەرەتایی لە موسڵ، (عومەر نەزمی) حاکمی ئاشتی لە کەرکوك، (عەبدولکەریم کەرکوکی) یەکێك لە حاکمەکانی بەسرە، ئەفسەرێکی سەرکردایەتی فرۆکەوانی بەریتانیی و (مارشەمعونی ئاشووری)[٥٨] ...[٥٩].

دوای ئەوە (٧) حەوت سەربازی (لیڤی) ئاسووری ودوان لە مەسیحییەکانی کەرکوك دەستگیر کران[٦٠].

لە (تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٤)دا لەبەردەم دادگای تایبەتی سەربازیدا وەستێنران، دادگاش نەیتوانی بە بەڵگەوە تاوانەکە بدات بەسەرهیچ یەکێکیاندا، لەبەر ئەوە ناچار بوو کە حوکمێکی سانایان بەسەردا بدا، بەوەی (هەشت) تاوانباریان حوکمی هەتاهەتاییان بەسەردادو (نۆیەم)یشیان (پێنج) ساڵ زیندانی بەسەردا درا لەگەڵ کاری زۆر قورسدا[٦١].

بەڵام عێراقییەکان ئەم حوکمەیان پەسەند نەبوو، لەبەر ئەوە چەند رێ و شوێنێکی ئاسایش گیرایە بەر هەتا رێگە نەدرێت بەکاری تووندوتیژی کردنە سەر ئاسورییەکان لە رێگەی هاتووچۆکردنیاندا بۆ بارەگاکانیان[٦٢].

لەلایەکی دیکەشەوە ئاسورییەکان هیچ گرنگییەکان نەدا بەو حوکمەی، کە درابوو بەسەر هاورێکانیاندا، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئینگلیزەکان دڵنیایان کردبوونەوە بەوەی، کە ئەم دادگاییە لەدواییدا دەگۆڕێت بۆ بەرژەوەندیان. (عەبدولرەزاق حەسەنی) باس لەوە دەکات، کە حکومەتی ئینگلیز زۆری لە حکومەتی عێراق دەکرد، کە لێبوردنێکی گشتی بۆ ئەم تاوانبارانە دەربکات و سەرجەم هەڵەکانی دەقۆستەوە بۆ بەدیهێنانی ئەم لێبوردنە[٦٣].

سەرئەنجام پاش دووساڵ لەرووداووەکەو لە رۆژی (٢٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٦)دا لەژێر فشاری حکومەتی بەریتانیادا حکومەتی عێراق بریاری لێخۆشبوونی دەرکرد، بەبیانووی ئەم هۆکارانەی خوارەوە:-

١- لەبەرئەوەی کارەکەیان شتێکی کاتی بووەو راستەخۆ چوونەتە نێووی و پێشتر بەرنامەرێژی بۆ نەکراوە.

٢- لەبەر ئەوەی ئەمانە غەریب (بیانیین)و کۆچیان پێکراوە بۆ کەرکوك، بەمەبەستی رزگاربوونیان لەو

کارەساتانەی کە تووشیان بووەو بۆ ئەوەی لە ژێر سایەی پارێزگاری حکومەتی عێراقدا بژین.

٣- خێزانەکانی ئەم تاوانبارانە لە حاڵەتێکی وادان، کە شایەنی بەزەیی پێداهاتنەوەن و پێویستیان بەبەدەستهێنانی بژێوی هەیە.

٤- تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر بەسەر ڕووداوەکە داوای کردووە لەبیر بچێتەوە، لەبەر ئەوە ناگونجێت ئەمانە بۆماوەیەکی دوورو درێژ لە زینداندا بمێننەوە.

٥- کاتێك کە ئەم لێبوردنە داواکراوە، بەچەند مەرجێکەوە پابەندەو ئەوان ناتوانین کە ئازادی ڕەها بەدەستبهێنن، ئەوکات ئەوان هەروەك ئەوە وایە کە دەست بەسەرین لە شوێنێکی دیاریکراودا، کە ئەمەش بۆ لێبوردنیان ڕێگە ئاسان ناکات.

لێرەوە (ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق) ڕازی بوو لەسەر ئەوەی، کە ئەمانە ئازاد بکرێن و بنێرێنە گوندی (مای) لە باکووری ڕۆژئاوای (ئامێدی)[٦٤].

ڕووداوی (٤ی ئایاری ساڵی ١٩٢٤)ی کەرکوك چەند شوێنەوارێکی لەسەر یەکەکانی (لیڤی) ئاسوری بەجێهێشت، لەو سیفەتە ئازایەتییەی کە پێی ناسرابوون جیاکردەوە بەمەبەستی لەسەر خەڵکی و بەخۆشاردنەوە لەبەرامبەر یاساو دەسەڵاتدا بەدیارکەوتن، ئەمەش بووە نیشانەیەکی ناشیرین بەسەریانەوە[٦٥].

لەم ئاشووبەدا دانیشتووانی کەرکوك بە کوردو کەمە نەتەوایەتییەکانی ناوەیەوە تووشی ئازارو گرفتێکی زۆر بوون و لەگەڵ ئەوەشدا هەڵوێستێکی یەکگرتوویان نیشاندا بەرامبەر بە هێزی (لیڤی)ەکان.

*** سەرچاوە و پەراوێزەکان:-**

* کەرکوك لە مێژوودا، نەتەوەکانی کۆنی میزۆپۆتامیا و دەورووبەری کاریگەرییان لەسەر ناوچەی کەرکوك، محەمەد باقی سەعید مستەفا. ٢٠١٤، ل٢٧٤-٢٧٦.

١- کاتێك بەریتانیا عێراقی ئێستای داگیرکرد، هێزێکی نێوخۆیی تێدا دامەزراند، بەمەبەستی شوێن گرتنەوەی هێزەکانی خۆیان و کەم کردنەوەی خەرجیە سەربازییەکانیان و لێدانی ڕاپەڕین و بزوتنەوەکانی نێو عێراق، ئەم هێزە لە نەتەوەجیاکانی عێراق و تەیارییەکان، کە لە تورکیاوە هێندرابوو بە نێوی (شوبانە، لوبی، لیڤی) پێکهێنران، ئینگلیزەکان لە ساڵی (١٩٢٣)دا هێزێکیان لە تەیارییەکان برد بۆ موسل و ناویان لێنان (ئاشووری)یەکان بەئامانجی ئەوەی کە ئەمانە پاشماوەی (دەوڵەتی ئاشوورین)، ئەو دەوڵەتەی کەلەلایەن (دەوڵەتی میدی)ەوە پێش (٢٦) سەدە لە نێوچوون و نەمان، تا ئەمڕۆش شوێنەوارەکانیان لە قووڵایی زەویدایە. (بڕوانە:- الملا جمیل الروزبیاني: کرکوك في العهد الاستعمار البریطاني والعهود التالیة، ت. انور مندلاوي، انترنیت، ل٥. د. کمال مظهر أحمد: کرکوك وتوابعها حکم التأریخ الضمیر، ج١، ل١٢٥. کریس کوچیرا: کورد لەسەردەمی نۆزدەو بیستدا، و. محەمەد کریم عارف، ل ٧٤- ٧٥).

٢- اثرم شبیرا: الآشوریون في الفکر العراقي المعاصر، دار الساقي، بیروت، لبنان، ٢٠٠١، ل ٧٥.

٣- مجموعة، الباحثین: کرکوك مدینة القومیات المتاخیة، ل ١١٠- ١١١.

٤- یوسف گۆران: مێژووی سیاسی تورکمان لە عێراقدا (١٩١٨- ١٩٩١)، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژ (٣)، ساڵی شەشەم، ١٩٩٨، ل٥٣. ریاض رشید ناجي الحیدري: الآشوریون في العراق (١٩١٨- ١٩٣٦)، مطبعة الجبوري، القاهرة، ١٩٧٧، ل ١٩٤- ١٩٥.

٥- ارشد الهرمزي: الترکمان في العراق، طبع بمطابع دار الزمان، بغداد، ١٩٧١، ل٢٩.

٦- الآشوریون والمسالة الآشوریة في العراق الحدیث، ترجمة. ج.د.ا الاهالي للطباعة والنشر، دمشق ١٩٨٩، ل١٣٠.

٧- مجموعة الباحثین: کرکوك مدینة القومیات المتاخیة، ل٣٦٠.

٨- عبدالرزاق الحسني: تأریخ الوزارات العراقیة، ج١، مجلد١، ط ٥، ل ١٩٩- ٢٠١.

٩- ریاض رشید ناجي الحیدري: الآشوریوین في العراق (١٩١٨- ١٩٣٦)، ل ١٩٧.

١٠- ق.ب ماتفیق (مارمتی): الآشوریون والمسالة الآشوریة في العراق الحدیث ت. ج.دا. ل ١٢٩- ١٣٠).

١١- د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر: کوردستان لە سەردەمی ئاشتیدا، د. محەمەد نوری تۆفیق، ل٢٢.

١٢- لە (١٥ی ئابی ساڵی ١٩٢٣)دا لەنێوان ئاسوریيە تەیارییەکانی تورکیاو دانیشتووانی موسڵدا دەنگە دەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەیەك لە بازاڕی (دیر مریم عزرا) ڕوویدا،

لەدوایدا بۆ ئەم رووداوە عەرەب و کوردی چەکداریش بەشداریان تێداکرد، ئەم کێشەیە لە دادگادا لەلایەن سەرکردایەتی هێزی ئینگلیزەوە گەیشتە ئەوەی، کە بەرنامە بۆ داڕێژراو نەبووە، لەبەرئەوە هیچ کەسێکیان سزا نەدا، بەڵام هەستی دڵەراوکێ لەلایەن هەریەکە لە (ئاسورییەکان)و دانیشتووانی نێوشار دروست بوو، سەرئەنجام ئاسورییەکان گوێزرانەوە بۆ کەرکوك. (ق.ب. ماتفییف (مارمتی)): الآشوريون والمسالة الآشورية في العصر الحديث، ترجمة م. د. ا، ل١٢٩. عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات العراقية ج١، مجلد، ط٥، ل١٩٨. ابرم شبيرا: الآشوريـون في الفكر العراقي المعاصر، ل٧٥).

١٣- رياض رشيد ناجي الحيدري: الآشوريون في العراق ١٩١٨. ١٩٣٦، ل١٩٤.

١٤- مجموعة الباحثين: كركوك مدينة القوميات المتاخية، ل ١١٠- ١١١.

١٥- رياض رشيد ناجي الحيدري: الاسوريون في العراق ١٩١٨- ١٩٣٦، ل ١٩٥.

١٦- شاسوار. خ. هەرشەمی: مێژووی ئارامییەکان لە کوردستاندا (حەرانی، جو، ئاسوری، سریانی)، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٢٨٥- ٢٨٦.

١٧- كامل ساڵەیی: موجز في تأريخ كركوك بين وثائق الماضي... وحقائق الحاچر، ل٣٤.

١٨- چاوپێکەوتن لەگەڵ (م. بێستون على كريم عەزین)، ڕۆژی چوارشەممە، سلێمانی، ١٢/ ٤/ ٢٠٠٦).

١٩- العراق في عهد القاسم، اراء وخواطر ١٩٥٨. ١٩٨٨م، ١٩٨٨م. ج٢. بدون سنة ومكان طبع. ل٧٣. مجموعة الباحثين: كركوك مدينة القوميات المتاخية، ل١٠٨- ١٠٩.

٢٠- بڕوانە" عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات العراقية، ج١، مجلد١، ط٥، ل١٩٨- ٢٠١، مجموعة الباحثين: كركوك مدينة القوميات المتاخية، ل١٠٧، لەتیف فاتیح فرج، کوردو کەرکوك، ب١، ل٣٣- ٣٤.

٢١- بڕوانە/ رياض رشيد ناجي الحيدري: الآشوريون في العراق ١٩١٨- ١٩٣٦، ل ١٩٥. الملا جميل الوزبياني: كركوك في عهد الاستعمار البريطاني وعهود التالية، ت. انور مندلاوي، انترنيت، ل٥- ٦.

٢٢- بڕوانە/ عزيز قادر الصانچي: تأريخ السياسي التركمان العراق، دار الساقي، بيروت، ١٩٩٩، ل ١١٩. لەتیف فاتیح فرج. کوردو کەرکوك، ل٣٣، مجموعة الباحثين: كركوك مدينة القوميات المتاخية، ل١٠٧.

٢٣- عصبة الأمم: مسالة الحدود بين تركية والعراق...، ل١٠١.

٢٤- (عەبدوڕەزاق حەسەنی) دەڵێت: ئەو دووپۆلیسە عێراقییە زۆر بەپەرۆشەوە هەوڵیاندا کەرێگە بگرن لە هێزی (لیڤی) ئاسوری تا خەڵکی بێتاوان نەکوژن، کەچی هەردوو پۆلیسەکەیان کوشت" (تأريخ الوزارات العراقيه، ج١، مجلد ١، ط٥، ل١٩٨).

٢٥- بڕوانە/ الملا جميل الروزبياني: كركوك في عهد البريطاني وعهود التالية، ت. انور مندلاوي انترنيت، ل٦، رياض رشيد ناجي الحيدري، الآشوريون في العراق، ١٩١٨- ١٩٣٦، ل ١٩٦.

٢٦- ئەم گەرماوەو زۆربەی گەرماوەکانی دیکەی تری کەرکوك بەیانیان زوو تاکو کاتژمێر (٨) بۆ پیاوان بوو، لەکاتژمێر (٨- ١٢) نێوەڕۆ بۆ ئافرەتان بوو، ئێوارانیش دووبارە بۆ پیاوان بووە. (چاوپێکەوتن لەگەڵ (م. بێستون عەلی کەریم عەزین)، ڕۆژی چوارشەممە، ١٢/ ٤/ ٢٠٠٦).

٢٧- لەتیف فاتیح فرج: کوردو کەرکوك، ب١، ل٣٣- ٣٤.

٢٨- مجموعة الباحثين: كركوك مدينة القوميات المتاخية، ل١٨٧. عبد الرزاق الحسني: تأريخ الوزارات العراقية مجلد ١، ج١، ط٥، ل١٩٨- ٢٠١.

٢٩- الملا جميل الروذبياني: كركوك في عهد الاستعمار البريطاني والعهود التالية، ت: انور مندلاوي انترنيت، ل٦.

٣٠ - سیسل جۆن ئیدمۆندس: کورد تورك عەرەب، و. حامید گەوهەری، ل٤٦٦. ٤٦٧، بەعەرەبی كرد وترك وعرب، ت. جرجيس فتح الله، ل ٣٤٩، عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات العراقية، ج١، مجلد ١، گ٥، ل ١٩٩.

٣١- العراق في عهد قاسم، اراء خواطر ١٩٥٨- ١٩٨٨، ج١، ل٧٣٦. مجموعة الباحثين: كركوك مدينة القوميان المتآخية، ل ١٠٩.

٣٢- يوسف مالك: الخيانة البريطانية للاثوريون، ترجمة وطبع الحركة الديمقرطية الآشورية. بدون مكان طبع، ١٩٨٥، ل ٢٠٤.

٣٣- سیسل جون ئیدمۆندس: کورد، تورك، عەرەب، حامید گەوهەری، ل٤٦٦- ٤٦٧. بەعەرەبی كرد وترك و عرب، جرجيس فتح الله، ل٣٤٩- ٣٥-. رياض رشيد ناجي الحيدري: الآشوريون في العراق ١٩١٨- ١٩٣٦، ل ١٩٨، عزيز قادر الصانچي: تأريخ السياسي لتركمان العراق، ل١٢٢. مجموعة الباحثين: كركوك مدينة القوميات المتاخية، ل ١٠٨.

٣٤- عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات العراقية، ج١، مجلد١، ط٥، ل ١٩٨، رياض رشيد ناجي الحيدري: الآشوريون في العراق ١٩١٨- ١٩٣٦ ل ١٦٩. مجموعة الباحثين: كركوك مدينة القوميات المتاخية، ل ١٠٤.

٣٥- سەبارەت بەژمارەی کوژاوەکانی ڕووداوی کەرکوك، نووسەران ژمارەی جیاوازیان نووسیوە، بۆ نموونە (عەبدولرەزاق حەسەنی) پێیوایە (٥٦) کوژراو (٤٤) بریندار هەبووە (ا) د. جەرجیس فەتحوڵڵا)لای وایە (٥٦) کوژراو (١١) بریندار هەبوون (ب)، (بێستون عەلی کەریم عەزین) پێیوایە ژمارەی کوژراوەکانی مەسیحییەکان (٥ بۆ ٢٠) کەس بووە ژمارەی کوژراوانی شارەکەش (٣٠ بۆ ٤٠) کەسبووەن (ج)، (یونس مالك) پێوایە (٥) سەربازی ئاشووری ٣٠ هاووڵاتی کوژراون (د)، (ا) - تأريخ الوزارات العراقية، ج١، مجلد ١، ط٥، ل ١٩٨ - ٢٠٠. ب - العراق في العهد القاسم اراء وخواطر ١٩٥٨. ١٩٨٨. ل ٧٣٦ ج- چاوپێکەوتنی توێژەر، ڕۆژی چوارشەممە، ١٤/ ٤/ ٢٠٠٦. د- الخيانة البريطانية للآشوريين، ل ٢٠٤).

٣٦- لەتیف فاتح فرج: کوردو کەرکوك، ب١، ل ٣٤- ٣٥.
٣٧- عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات العراقية، ج١، مجلد١، ط٥، ل ١٩٨. رياض رشيد ناجي الحيدري، الآشوريون في العراق ١٩١٨- ١٩٣٦ ل ١٩٨.
٣٨- علاء الدين سوجادي: شۆڕشەکانی کوردوو کۆماری عێراق، چاپخانەی مەعاریف، بەغداد ١٩٥٩، ل ١٠٤.
٣٩- یوسف گۆران: کوردو تورکمان تێوانینێك بۆ میکانزمەکانی پێکەوە ژیانی ئاشتیانەی نێوانیان، ل٨.
٤٠- الملا جميل الوزبياني: كركوك في عهد الاستعمار البريطاني والعهود التالية، ت. انور مندلاوي، انترنيت، ل ٦. لەتیف فاتیح فرج: کوردو کەرکوك. ب١، ل ٣٤. عزيز قادر الصانجي: تأريخ السياسى التركمان العراق، ل١٢٠.
٤١- علاء الدين سوجادي: شۆڕشەکانی کوردو کۆماری عێراق. ل ١٠٤.
٤٢- الملا جميل الروزبياني: كركوك في عهد الاستعمار البريطاني والعهود التالية. ت. انور مندلاوي، انترنيت. ل٦.
٤٣- لەتیف فاتح فرج: کوردو کەرکوك، ب١، ل ٣٤.
Kurds Arabs. Britions: Editedand Intraduction . By: D. Fieldhouse.London and Newyork. P. ١٥٤.
٤٤- رياض رشيد ناجي الحيدري: الاثوريون في العراق ١٩١٨- ١٩٣٦، ل ٢٠٠.
٤٥- مجموعة الباحثين: كركوك مدينة القوميات المتاخية، ل ١٠٤.
٤٦- جريدة الموصل: عدد ٨٠٧، ١٤ مايسى ١٩٢٤. "بيان".
٤٧- العالم العربي: عدد ١٣٨. ٤ی ئەیلول ١٩٢٤.
٤٨- پێشتریش حکومەتی عێراقی بڕی (١٠) هەزار ڕوپیەی بۆ ئەو مەبەستە تەرخانکردبوو. (العالم العربي: عدد ١٥، ٣ تشريني الثاني ١٩٢٤).
٤٩- رياض رشيد ناجي الحيدري: الآشوريون في العراق ١٩١٨- ١٩٣٦، ل ١٩٩ - ٢٠٠. عبد الرزاق الحسني: تأريخ الوزارات العراقية، مجلد ١، ل ٢٠١- ٢٠٢.
٥٠- بڕوانە/ العراق: عدد (١٢٢٤)، ١٩ی ئایاری (١٩٢٤).
٥١- بڕوانە/ الحكومة العراقية: مجموعة مذكرات المجلس التاسيس العراقي، ج١، بغداد، ١٩٢٤م- ١٣٤٣ق، ل ١٧٩- ١٩٠.
٥٢- هەمان سەرچاوە، ل١٩١- ١٩٤.
٥٣- الحكومة العراقية: مجموعة مذكرات المجلس التاسيسي العراقي، ج١، ل١٨١- ١٨٢.
٥٤- هەمان سەرچاوە، ل ١٨٢- ١٨٣.
٥٥- هەمان سەرچاوە، ل ١٨١.
٥٦- الحكومة العراقية: مجموعة المذكرات المجلسي التاسيس العراقي، ج١، ل ١٩٦.
٥٧- شێخ ئەحمەد داوەری ئەندامی ئەنجومەنی دامەزرێنەر، ڕەخنەی لە ئەندامێتی، (مارشەمعون) بۆ دادگاییکردنی تاوانبارانی ڕووداوەکەی کەرکوك گرت. (رياض رشيد ناجي الحميدي: الاثوريون في العراق ١٩١٨- ١٩٣٦، ل٢٠).
٥٨- مجموعة الباحثين: كركوك مدينة القوميات المتاخية، ل ١٠٩.
٥٩- رياض رشيد ناجي الحيدري: الآشوريون في العراق ١٩١٨. ١٩٣٨، ل ١٩٩. عبد الرزاق الحسني: تأريخ الوزارات العراقية، ج١، مجلد ١، ط٥، ل ١٩٨- ١٩٩.
٦٠- مجموعة الباحثين: كركوك مدينة القوميات المتاخية، ل ١٠٩.
٦١- رياض رشيد ناجي الحيدري: الآثوريون في العراق ١٩١٨- ١٩٣٦، ل ٢٠٩.
٦٢- تأريخ الوزارات العراقية، ج١، مجلد ١ ط٥، ل ٢٠٢- ٢٠٣.
٦٣- مجموعة الباحثين، كركوك مدينة القوميات المتاخية، ل ١٠٩- ١١٠.
٦٤- رياض رشيد ناجي الحيدري: الاثوريون في العراق ١٩١٨ - ١٩٣٦. ل ٢١٠.

## * نەوتی کەرکوك لە روانگەی سەردەمە مێژووییەکاندا

د. دڵشاد عومەر عەبدولعەزیز

مێژووی شارەزابوونی مرۆڤ بە نەوت و شێوەکانی، مێژوویەکی کۆنە. بۆ یەکەمجار نەوتی خاو و شێوەکانی بەتایبەتی(زفت وقیر) بەکارهێنراوە لەلایەن ئەو مرۆڤانەی کە سەرەتای دامەزرێنەری شارستانی بوون، وەك شارستانی میزۆپۆتامیا و شارستانی میسر و شارستانی هێلینی و شارستانی چین و ژاپۆن و ئەمریکای باشوور، هەروەها دانیشتووانی فارس و ماددەکان و عەرەبە کۆنەکان[١]، بەڵام ئەم مرۆڤانە هەریەك بەپێی زانیاری و توانای خۆیان بەکاریان هێناوە لە بوارە جیاجیاکانی ژیاندا(بۆ رووناکی، گەرمکردنەوە، سووتاندن، لە بواری پزیشکی و چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان، لە بواری پیشەسازی و فەرشکردنی رێگاوبانەکان، بۆ رووپۆشکردنی کەشتییەکان، یان بۆ مۆمیاکردنی مردووەکان و چەندین بواری تر[٢]، ئەتوانین بڵێین مرۆڤ نەوتی وەك هەموو ماددە و کەرەستەکانی تری ژیان لە کۆنەوە بەکارهێناوەو کەڵکی لێوەرگرتووە، بەڵام بۆ چەند مەبەستێکی تایبەت و هەندێك پێداویستی ژیان بە کاریهێناوە، نەك بۆ مەبەستی پیشەسازی یاخود بازرگانی. ئەو سەردەمەش کە ئەم بەرهەمە بەکارهێنراوە یاخود لە بەردەستبووە، لەئەنجامی چالاکی مرۆڤ نەبووە، بەڵکو بە شێوەیەکی سروشتی لەسەر رووی زەوی کۆبوەتەوە، لەهەمان کاتدا درکی بە گرنگی نەوت لە رووی بازرگانی و پیشەسازی نەکردووە، یاخود ئەوەندە شارەزا نەبووە تاکو بزانێت لە زۆربەی بوارەکاندا بەکاری بهێنێت[٣].

لە مێژووی کۆنی شارستانی میزۆپۆتامیا نەوتی خاو و شێوەکانی پێگەیەکی گرنگ و بایەخداری هەبووە، چوار هەزار ساڵ لەمەوبەر بەگوێرەی قسەکانی هێرودۆتس، کە لەلایەن (دیۆدۆرس)ەوە جەختی لەسەر کراوەتەوە[٤]، جگە لەوەش چەندین پاشماوەی کۆن لەم شارستانیەتە بەدەستەوەیە بۆ بوونی نەوت، سۆمەرییەکان ماددەی ئەسفەلت و قیریان(Bitumen ،Asphalt) بەکارهێناوە بۆ دروستکردنی دیوار و قوولەکانی شاری بابل[٥]، ئەم ماددەیەیان لە ناوچەی (کفری)یەوە هێنارە و سەرچاوەی ئەم زانیارەش لە دەقە کۆنەکانی هەواڵی فەرمانرەوایی سۆمەری( گودیە-گۆتی) لە دەورووبەری ساڵی (٢٣٠٠ پ.ن) وەرگیراوە، کە باس لە کانەکانی قیر و ئەسفەلت لە ناوچە شاخاوییەکان دەکات[٦]، هەروەها دانیشتووانی (لەگەش)* سوودیان لەم ناوچانە وەرگرتووە، بەتایبەتی ناوچەکانی دەورووبەری کەرکوك ئەم کەرەستانەیان لە رێگای رووباری عوزێمەوە گواستووتەوە[٧] سۆمەرییەکان سوودیان لە کەرەستەی ئەسفەلت وەرگرتوە لە ناوچەی (هیت) لە بواری بیناسازی بەکاریبهێنن، جگە لەوەش بۆ مۆمیاکردن و پیشەسازی کەشتی، بەکاریان هێناوە...[٨].

سەرچاوە مێژووییەکانیش ئاماژە بەوە دەکەن، کە بابلییەکان سوودی زۆریان لە نەوت و شێوەکانی وەرگرتوە لە بوارەکانی بیناسازی و پیشەسازی کەشتیدا، بۆ فەرشکردنی رێگاکان و بۆ دروستکردنی پەیکەرو کۆتەڵەکانیان بەکاریان هێناوە. پاشماوەکانی شاری بابل تا ئێستاش ئاسەواری بەکارهێنانی ئەسفەلت و قیر لە بیناکانیان ماوە، وەك پەرستگای نەبوخزنەسەرو تاوەری بابل، شوێنەواری تا ئێستا ماوە بە قیر لەیەکتر بەستراوە[٩].

لە دەورووبەری(٦٥٢-٦٠٤پ.ن) لە سەردەمی نەبوخزنسەر(٦٠٤-٥١٦پ.ن) بابلییەکان بە نەوت و ئەسفەلت ئاگریان بەرداوەتە ئاگردانی ئاتوون و بڵێسەی بەرزبووتەوە نزیکەی ٤٩ پێ[١٠].زانای رۆمانی (پلینۆسی گەورە(٧٩-٢٣ پ.ن)) رووداوێکی سەیر دەگێرێتەوە لە پەرتووکی(مێژووی سروشتی) دەڵێت:"ئامیش کچی پاشای میدییەکان هەروەها ژنی نەبوخزنەسەر بوو، دۆستی پیاوەکەی بە نەوت تەردەکات کاتێك دەچێت بۆ لای نەبووخزنەسەر بۆ کرنووش بردن و بە ئاگری گردان دەسوتێت"[١١].

لە سەردەمی ئاشورییەکانیش نەوت و شێوەکانی بۆ ناوپۆشکردنی پەرستگاکان و کەشتییەکان بەکارهاتووە. پاشا سەنحاریب لە دەورووبەری(٧٠٠ پ.ن) سیستەمێکی نوێی بەکارهێناوە بۆ جۆگەلەی رووبارەکان لە کوردستان بۆ رێکخستنی رێرەوی ئاو، قیری بەکارهێناوە بۆ ئەم کارە. لە بواری پزیشکی بەکاریان هێناوە بەتایبەتی لە نەشتەرگەری، هەروەها بۆ سزادانی تاوانباران بەکاریان هێناوە بە چۆڕانەوەی قیری گەرم بەسەریاندا. لە دەورووبەری ساڵی(٦٥٠پ.ن) دەقێکی ئاشووری هەیە، کە هاوچەرخە لەگەڵ پاشا ئاشوور بانیپاڵ ئاماژە بە بوونی سەرچاوەیەکی نەوت دەکات نەوتەکەشی لە جۆری سپیە[١٢].

کتێبی پیرۆزی (تەورات)یش ئاماژەی کردووە بە بوونی نەوتی خاوو شێوەکانی، بەکاریش هێنراوە لە لایان مرۆڤەوە، لە ئاماژەیەکدا تەورات[١٣] دەڵێت"پێغەمبەر نووح ئەسفەلت و قیری بۆ ناوپۆشکردنی کەشتیەکەی بەکارهێناوە"هەروەها لە ئاماژەیەکی تردا هاتووە کە باس لە چۆنێەتی دروستکردنی تاوەری بابل، کە چۆن خشت لە جیاتی بەردو قیر لە جیاتی شتی تر بەکارهاتووە[١٤].

عەرەبەکان لە سەردەمی جاهلی پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ نەوت و شێوەکانی نەبوو، تەنانەت زۆر جار بە سەرچاوەی ئەنجامی خەراپ و شەڕ دادەنرا لە لایان[١٥]، بەڵام لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا لە جەنگ و ئاشتیدا بەکارهێنراوە، سوودیان لە چەکی ئاگری گریك(Greek fire)[١٦] وەرگرتووە، تەنانەت دەڵێن کەعبەی پیرۆز بە هەمان چەك سوتێندراوە، لە ساڵی(٦٤ك/٦٤٤ن)، لە شەڕی نێوان عەبدوڵڵای کوری زوبێرو یەزیدی کوری معاوییەدا[١٧].

لەسەردەمی عەباسییەکان لە بواری جیاجیادا زیاتر بەکارهاتووە، بەتایبەتی لە رووناکردنەوەی شارەکاندا، هەروەها فانوسی عەلاددین، کە لە شاکاری(الف ليلة وليلة) ناوی هاتوو هەر بە نەوت بەکارهاتووە[١٨]. لەسەردەمی

هاروونە رەشید زیاتر لە بواری جەنگ و سۆپادا بەكارهاتووە، تەنانەت زۆر بەتووندی بەكاریان هێناوە لە دژی دوژمن و ناحەزەكانیان. تیپێكی تایبەتی هەبوو بۆ ئەم كارە بە ناوی(زراقون)، هەروەها تەرمی یەحیا بەرمەكیان بە نەوت سووتاندووە[١٩]، كۆمەڵێك هەبوون بەناوی(نفاطین) ڕۆڵێكی یەكجار گەورەیان بینی لە ناكۆكی نێوان ئەمین و مەئمون دا، تەواوی تۆمارگەكانی دەوڵەتیان سووتاند[٢٠]، هەروەها خەلیفە (موعتەسەم) ئامێرێكی بەكارهێنا لە ئاگر ونەوت پێكهاتبوو بۆ جەنگی (عەمووریە٢٢٣ك/٨٠٣ن)* لە دژی ڕۆم، تەنانەت سەرچاوەیەك ئاماژە دەكات، مەغۆلەكان لە كاتی داگیركردنی شاری بەغدا(٦٥٦ك/١٢٥٨ن)چەكی(مەنجەنیق) یان بەكارهێناوە، كە تۆپەڵە قیری فڕێ دەدا، ئەم قیرەشیان لە ناوچەكانی كەركوك و موسڵ هێنابوو[٢١]. لە ساڵی (٥٨٥ك/١١٨٩ن) میر عیزەدین مەسعوودی زەنگی، كە میری شاری موسڵ بوو بارێكی زۆر لە نەوت و قیری ناوچەی موسڵ دەنێرێت بۆ سوڵتان سەلاحەدینی ئەیووبی بۆ بەكارهێنانی لە جەنگی بەرامبەر بە خاچ دروشمەكان[٢٢].

ئاشنابوونی خەڵكی كوردستانیش بە نەوت فراوان بوو لە چاو گەلانی تر، چونكە پاشماوە و شوێنەواری نەوت و شێوەكان لە كوردستان لە دێر زەماندا هەبووە، بڕێكی زۆر لە نەوت لە ناوچە جیاجیاكاندا بوونی هەبووە، بەڵام بە كارهێنانی هەر وەك گەلانی تر لەبواری تەسك دا بووە و نەیانتوانیوە كەڵكی زۆری لێ وەرگرن، بەپێی زانستی ئاركیلۆژی و شوێنەواری و كەلوپەلانەی لە ناوچەكانی كوردستان دۆزاوەتەوە كە (قیر وئەسفەلت) لە (شوش) ٥-٦ هەزار ساڵ پێش زاین بەكارهاتوە، دانیشتووانی كوردستان نەوتیان بەئامرازی ئاوكێشان وەكو كوندەو مەشكە وگۆزە و تەنكە، لەسەر پشتی وڵاخەكانیان گواستویانەتەوە بۆ پێویستییەكانی خۆیان بەكاریان هێناوە[٢٣].

لە هەزارەی پێنجەمی پێش زایندا لە ناوچەكانی باشووری كوردستانیش نەوتی خاو و شێوەكانی بوونی هەبووە و وەزانراوە و بەكارهێنراوە[٢٤]، هەندێكی تر دەیگەڕێننەوە بۆ پێش ئەم مێژووەش[٢٥]، هەندێك سەرچاوەی تر دەیگێڕنەوە بۆ چاخەكانی پێش مێژوو. بەپێی دۆزینەوەی شوێنەواری لە ناوچەكانی گوندی (چەرموو)**، كە هەندێك پاشماوەی لە كەرەستەی كشتوكاڵی، كە(قیر و ئەسفەلت) بەشێك بووە لەپێكهاتەكانی[٢٦]. بەڵام بەشێوەیەكی ئاشكرا، بوونی نەوت و شێوەكانی لە ناوچەی زاخۆدا هەبووە، بەردەوام لە هەڵقوڵیندا بووە، لە سەرچاوەیەكە لە سەر ڕووباری خاپوردا[٢٧]. بوونی بتیومین(قیر یان زفت) لە ناوچەكانی(گەیارە) لە نزیك شاری موسڵ هەبوو تەنانەت ناوی(قیارە) بەزمانی عەرەبی لە وشەی قیر هاتووە[٢٨]، لە ناوچەی(نەفتخانە) بڕێكی زۆر نەوت هەبووە، جگە لەوە ناوچەی كفری و خوورماتوو بوونی بیری نەوت وبڕێكی زۆر لە قیر و ئەسفەلت هەبووە، كە سوودی زۆری بۆ ناوچەكانی باشووری میزۆبۆتامیا گەیاندووە[٢٩].

نەوتی خاو وشێوەكانی لە ناوچەی كەركوك بەتایبەتی لە(باباگوڕگوڕ) بوونێكی بەرچاوی هەبووە، لە شێوەی گازە سروشتییەكانی كە ڕووە و ئاسمان هەڵچووە و ئاگر گڕی گرتووە[٣٠]، دەیگەڕێننەوە بۆ هەزارەی پێنجەمی پێش زاینی[٣١] لە سەردەمی سۆمەرییەكان دانیشتووانی (لەگەش)، بۆ دروستكردنی شاری(بەرزی بابل)سوودیان لە نەوت و شێوەكانی ناوچەی كەركوك دەوروبەری وەرگرتووە[٣٢]. لە سەردەمی (گودیا) پاشای لەگەش لە دەوروبەری(٢١٢٠ پ.ن)، كەوا گوتیوم(كەركوك و دەوروبەری دەكات) چەندیی جۆری كانزای ڕەوانەی سۆمەرییەكان كردووە[٣٣]، دانیشتووانی شاری كەركوك لەو باوەڕدان، كە ئەم ئاگرە ئەزەلییە لە گەشتەكەی(دانیال پێغەمبەر–سفر دانیال النبی) باسی لێوەكراوە[٣٤].

لەسەردەمی مادەكاندا ئاگری باباگوڕگوڕ گرنگی تایبەتی هەبووە، بەو پێیەی، كە ئاینی زەردەشتی پیرۆزی تایبەتیان هەبوو بۆ ئاگر وئاینی مادەكان بوو، بۆیە نازناوی باباگوڕگوڕ لەلایەن مادەكانەوە ناوی لێنراوە، لەم بوارەشدا دكتۆر جەمال ڕەشید بە ڕوونی باسی دەكات و دەڵێت"لە ژێر تیشكی زانستی ئیتومۆلۆژیدا نازنێوی ئەم شارە بەشێوەی كەركوك، بێگومان پەیوەندییەكی تووندی لەگەڵ وشەی كوركورت گورگور هەیە، كە لە لایانەوە...بەكارهاتووە، ئەوجا وەك(كوركور+ەك) لەلایەن ئەمانەوە بڵاوبۆتەوە، نازناوەكەش لە زۆربەی زمانە ئێرانییەكاندا پێوەندی بە ئاگری پیرۆزی زەردەشتییەكانەوە هەیە"[٣٥].

هەندێك لە سەرچاوە مێژووییەكان ئاماژە بە نەوتی خاو و ئاگری ئەزەلی باباگوڕگوڕ بوونێكی بەرچاوی هەیە لە سەردەمی نەبووخزنەسەر(٦٠٤-٥١٦پ.ن)دا[٣٦]، هەروەها باوەڕێكیش هەیە، كە دەڵێن نەبووخزنەسەر سێ جولەكەی فڕێداوەتە ناو ئەم ئاگرە و سووتاندوونی[٣٧].

هێروودوتس* مێژوونووسی گەورەی یۆنانی (٤٨٤-٤٢٥پ.ن) ئاماژەی بە بوونی نەوت كردووتەوە و باسی ئاگری ئەزەلی باباگوڕگوڕی كردووە و دەڵێت"دوو شوێنەواری گەورە هەیە لە شاری كەركوك یەكەمیان ئەو گۆڕەیە، كە ناسراوە بە مەزاری(دانیال)و مەبەست لە ئاگری ئەزەلی باباگوڕگورە... دووەمیان ئەو تاوەریە، كە مێژووەكەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سەلوقییەكان... "، هەروەها ئاماژەی بە هەندێك لەو سەرچاوە نەوتیانە كردووە، كە دانیشتووانی شار بە ئامرازی سەرەتایی دەری دەهێنن..."[٣٨].

بەپێی نووسراویكی مێژوونووسی بەناوبانگی یۆنانی بەناوی(پلۆتارخۆس(٤٥ز-١٢٥ن))، كە باس لە تێپەڕبوونی مەكەدوونییەكان بە شاری(ئەرابخا)دا[٣٩] بەرەو بابل لە ساڵی (٣٣١ پ.ن) دەكات و دەڵێت"كەوا لە ئەشكەوتێكدا ئاگر دێتە دەرەوە و لە نزیكیدا سەرچاوەیەكی نەوتی ڕەشی تێدایە"[٤٠].

بەپێی ئەم سەرچاوە مێژووییانە هەبوونی نەوتی خاو وشێوەكانی لە ناوچەی كەركوك، شوێنێكی تایبەتی خۆی لە ژیانی كۆمەڵایەتی و سیاسی وئابووری هەبووە بۆ دانیشتووانی شارەكەو و كوردستان و میزۆپوتامیا و وڵاتانی دەوروبەری:

لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوە بەپێی سەرچاوە مێژووییەكان پەیوەندییەكی توورند هەبوو لەنێوان ئاگری هەمیشەیی

باباگورگور و ئاینی زەردەشتی، کە لە سەردەمی مادەکانەوە تاکو هاتنی بنەماڵەی ساسانییەکان، کە ئاینی زەردەشتی ئاینی دەوڵەت بووە، بەردەوام بووە. تەنانەت کوردەکانی سەر بە ئاینی زەردەشتی لەسەردەمی ساسانی نوێ دا ناوی باباگورگوریان داهێناوە(٤١)، هەر لەبەر پیرۆزی ئاگری باباگورگور بەلای خەڵکی زەردەشتیەوە ناوچەی گەرمیان و هەولێر و کەرکوك و دەوروبەری دەپەرسترا، یاخود بە پیرۆزی رادەگیرا و بەیانیان زوو دەهاتن لە چواردەورەی ئەم ئاگرە کۆدەبوونەوە بۆ نوێژو وێرکردن لە سەدەی شەشەمی زاینیدا(٤٢).

لە بواری ئابووریشدا سوودێکی زۆری هەبوو بۆ دانیشتووان و ناوچەکانی دەوروبەری، بۆ زۆر پێداویستی بەکاریان هێناوە، شەوانی تاریکیان پێی رووناك کردووتەوە، نەخۆشی پێستیان پێ چاك کردووتەوە، هەندێك کەرەستەی کشتوکاڵیان پێ دروستکردووە، هەروەها ناو ماڵیان پێ ناوپۆش کردووتەوە، هەندێك جاریش بازرگانیان پێوە کردووە، ئەم کارانەش لە چەندین سەرچاوەی مێژوویی ئاماژەی پێوە کراوە، بەتایبەتی بۆ بەکارهێنانی قیر لە فەرشکردنی رێگا و بانەکانی شاری (ئور، بابل، لەگەش) یان بۆ دروستکردنی(تاوەری بابل) لەلایەن لەگەشەکان بەکارهاتووە، بەتایبەتی لە باباگورگور و خوورماتوو و کفری و نەفتخانە، لە رێگای رووباری عوزێمەوە بۆ ئەو شارانە بردراوە(٤٣)، تەنانەت بازرگانی هەرێمیشی پێوە کراوە وەك میسرییە کۆنەکان سوودیان لێ وەرگرتووە لەسەردەمی فیرعەونەکان نەوتی رەش و قیریان بەکارهێناوە بۆ مۆمیاکردنی مردووەکان لە ناوچەی هیت و گەیارە براوە(٤٤).

لە رووی سەربازیشەوە نەوت وشێوەکانی ناوچەی کەرکوك و دەوروبەری سوودێکی گەورەی هەبووە لە دروستکردنی چەك و هەندێك ئامێری جەنگی، کە زۆربەی زۆری هۆزەکانی میزۆپۆتامیا سوودیان لێ وەرگرتووە(٤٥).

لە رووی سیاسییەوە بەهۆی هەبوونی نەوت وشێوەکانی لە کەرکوك کەوتبووە بەردەم هێرشی بەردەوامی هۆزەکان و هەمیشە لە ژێر فشاری هێرشی داگیرکەردا بووە، ئەوەتا کاتێك فارسەکان بەم ئاگرەی باباگورگور یان زانیوە، یەکسەر داگیریان کردووە(٤٦)، لە نیوەی یەکەمی سەدەی ١٦دا ناوچەی عێراق(ئێستا) بەگشتی و کەرکوك بەتایبەتی، کەوتنە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی(٤٧)، بۆیە ئەم ناوچەیە لە رووی سیاسی و کارگێری و ئابووری سەر بە دەوڵەتی عوسمانی مایەوە، تا کۆتاییەکانی جەنگی جیهانی یەکەم لە ساڵی ١٩١٨، بەریتانیا دەست بەسەر کەرکوکدا دەگرێت(٤٨).

هەڵقوڵانی نەوتی خاو لە باشووری کوردستان(باباگورگور) و ناوچەکانی تری عێراق بە شێوەیەکی سروشتی، سەرنجی زۆر لە گەریدە و گەرۆکەکانی ئەورووپی و ناوچەیی لە سەدەی ١٨مەوە بەلای خۆیدا راکێشاوە، ئەوانیش لەنامەی تایبەتی رۆژانە و لە یاداشتەکانیاندا ئەم سامانە گرنگەیان بە جیهان ناساندووە، ئاماژەیان پێکردووە.

م.ئۆتەر(M.Oter) لە ساڵی (١٧٣٦) لە گەشتەکەیدا دەگاتە شاری کەرکوك و ئاماژەی بەبوونی نەوت کردووە لە باباگورگور و دەڵێت: "دانیشتووان، کە دەچن بۆ ئەم ناوچەیە، بۆ هەڵکەندنی چاڵێك یەکسەر ئاگر دەردەچێت و بەرز دەبێتەو بۆ سەرەوە، هەروەها ئاوی ئەم ناوچەیە پلەیەکی بەرزی گەرمی هەیە... سێ سەرچاوەی(منزات)تایبەت هەیە بۆ هەڵقوڵانی نەوت، کە ئالەیەکی لێ دەردەچێت و بێزارت دەکات، ئەگەر پارچە قوماشێك فڕێ دەیتە ناوی یەکسەر گردەگرێت، ئەمەش شوێنێکی سەیرە سەرەنجی گەشتیاران بۆلای خۆی رادەکێشێت بۆ سەیرکردنی"(٤٩).

گەریدەی دانیمارکی کارستون نیبور(C.Niebuhr) کە لە ١٠-٣-١٧٦٦، دەگاتە شاری کەرکوك و دەوروبەری، وا باس لەو سامانە سروشتیانە و قیر دەکات و دەڵێت: "لە نزیك شاری کەرکوك سەرچاوەی نەوت و قیر هەیە، شوێنێك هەیە بەناوی باباگورگور زۆر سەرسورهێنەرە... بەتایبەتی خاکەکەی زۆر گەرمە تەنانەت دەتوانی گۆشت و هێلکەی لێ بکوڵێنی..." بەردەوام دەبێت ودەڵێت: "مرۆڤ پێویستی بە هەڵکەندنی زۆر نیە بۆ گەیشتن بەو مادانە..." و دەڵێت:"چەندین کەس بۆیان گێڕاوەتەوە کە ئاگرێکی بەرز گڕی گرتووە بەرووی ئاسمان و خەڵکی زۆر دەڕۆن بۆ سەیرکردنی"(٥٠)، جگە لەوەش نیبور لە گەشتەکەیدا بە شارۆچکەی خوورماتوو تێپەڕیووە ئاماژە بەبوونی سەرچاوەی نەوت و قیر دەکات و دەڵێت: "نەوت لەم شوێنەدا زۆر بە نرخە و دانیشتووان بەکاری دەهێنن بۆ رووناکردنەوەی چراکانیان لە جیاتی (رۆن)، نەوتی سپییش بەکاردەهێنرێت بۆ چاك بوونەوە لە هەندێك نەخۆشی"(٥١).

لە ساڵی(١٧٧٩)دا گەریدەی فەرەنسی م.د.. دانفیل(M.D.Danville) لە گەشتەکەیدا دەربارەی شاری کەرکوك دەڵێت:"هەندێك بەرد هەیە لە نزیك کەرکوك هەڵگری ئەو نەوتەیە، کە دانیشتووان لە کێڵگە جۆراوجۆرەکان دەریدەهێنن "(٥٢)، دانفیل درێژە دەدات و دەڵێت: "زانستی جوگرافیای تورکیا ئاماژەی بە ئاگری باباگورگور کردووە، کە چەند گەرمە ودەتوانیت ئاوی لەسەرگەرم بکەی"(٥٣).

دواتر گەریدەی فەرەنسی ئۆلیڤیە(G.A.Olivier) لە ساڵانی(١٧٩٤-١٧٩٦) ئاماژەی بەبوونی نەوت لەشاری کەرکوك کردەوە و دەڵێت:"... تەپۆڵکەیەکمان بینی کە لە خۆڵ و بەرد پێکهاتبوو، هەروەها پاشماوەی گەچی سپیکاریمان بینی و لەژێریا نەوت رێچکەی بەستبوو لە زۆر جێگەدا، دانیشتووانی شارەکە بیریان هەڵدەکەند بە قووڵایی ٥ تا ١٢ پێ، رۆژانە نەوتیان دەردەهێناو کۆیاندەکردەوە و دەیان گواستەوە لەسەر پشتی وڵاخەکانیان بۆ کەرکوك...، ئەو قەشەیەی هاورێیەتیمانی دەکرد پێی راگەیاندبووین کە بە دووری یەك فەرسەخ لەو شوێنەی لێیبووین بەرەو ئاراستەی باشووری رۆژهەڵات لە شوێنێکی فراوان، گڵپەی ئاگرێك دەردەچێت..."(٥٤).

ج.جاکسون(J.Jackson)ی ئینگلیزی دەربارەی بوونی نەوت لە کەرکوك دەڵێت:" لە کاتی گەرانمان بە ناو ئەم شارەدا گەیشتینە زنجیرەیەك بەرزایی، کە لە نزیکیدا چەند کێڵگەیەکی نەوتمان بینی، قووڵیی هەریەك لەو چاڵانە ٣ پێ بووە و نەوت بەبڕێکی زۆر بوونی هەیە وەك شلەمەنییەکی

سەخت و بۆنێکی توندی هەیە وەك ئەوقارەی لە خەڵۆزی بەردینی دەردەچێت..."[٥٥] .

(جیمس سیلك بگنهام James Silk Buckingham)*، کە لە بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا ئاماژە بە گەیشتنی بۆ شاری کەرکوك دەدات لەرۆژی ٦ تەموزی ساڵی(١٨١٦) دا دەڵێت: " لێرەدا بیستوومە، کە ژمارەیەکی زۆر لە کێڵگەی نەوت هەیە لەم شارەدا، بوونی زەوییەك کە ئاگرێك بەرز بووتەوە لە ناویدا بەرووی ئاسماندا...، بوونی ئەم ئاگرە و نەوتە لەم ناوچەیەدا ئەوە بەخشندەیی خوایە بۆیان"[٥٦].

لەسەدەی نۆزدەهەم کلۆدیوس جیمس ریچ(C.J. Rich)**، بە دەورووبەری شاری کەرکوك تێدەپەڕێت لە رۆژی ٢٨ نیسانی ١٨٢٠ ئاماژەی بە سەرچاوەی نەوت کردووە لە خوورماتوو، دەڵێت: "بیرێك هەیە لەناو زوورگەکانی ئەم شارەدا کەوتووەتە باشووری رۆژهەڵاتی شارەکەوە. ئەو بیرە دوور بووە و قووڵاییەکەی نزیك ١٥ پێ بووە و ١٠ پێش ئاوی تێدا بووە...رۆژانە دوو گۆزەی لێ پڕکراوە، کە هەریەکە یان شەش حۆقە*** بوو، لە دەرەوەی شارەکەش لەسەر رێگای کفری لە ناو زورگەکاندا، هەندێك لای باشووری بیرەکەی یەکەم، چەند بیرێکی تر هەیە ژمارەیان پێنج شەش دانە بوونەو بەرهەمیشیان لەناوچەکەی پێشوو زۆرتر بوو"[٥٧].

کەسایەتی بەناوبانگی عەرەبی محەمەدی کوری سەید ئەحمەد، کە ناسراوە بە (المنشيء البغدادي) لە ساڵی (١٨٢١) گەشتێك بەناو کوردستان دەکات بە شاری خوورماتووش تێی دەپەڕێت و دەڵێت: "لەنزیك چیا نزیکەکانی ئەم شارە نەوتی رەش هەیە"[٥٨] .

لە ساڵی(١٨٤٢)دا (مێژەر بولتۆن) سەرەنجی لە مەسەلەی سامانی نەوت لە کوردستاندا داوە، لەو وتارەی کە لە کۆڕی پاشایەتی عوسمانیدا خوێندوویەتییەوە، سەرەنجی گوێگرەکانی بۆ گرنگی نەوتی کوردستان راکێشاوە[٥٩].

گەریدەی هۆڵەندی لیکلاما لە ساڵی(١٨٦٥) دا باسی لە سەرچاوەی نەوت و ئاگری ئەزەلی باباگورگور کردووە[٦٠].

گەریدە (ژاك رێتۆرێ)**** فەرەنسی لە گەشتەکەیدا لە ٢٥ حوزەیرانی ١٨٧٨ دەگاتە شاری کەرکوك و باسی ئاگری ئەزەلی باباگورگور دەکات، ئاماژە بەبوونی نەوت دەکات لەم شارەدا و دەڵێت: "شارەکە وایێ دەچێت لەسەر زەوییەکی بورکاناوی دروستکرابێ، لە دەرەوەی شوورەکانی شارەکە، لە نزیك ئەو گردانەی کە لە نزیك شارەکەن، بەشقاری زەوییەکەدا، لە زۆر جێگەدا ئاگرێکی شیناوی لێ بەرز دەبێتەوە، کە بەزمانی بازاری پێی دەڵێن بابەگورگور، لەیەك کاتژمێری شارەکەدا، لەسەر رێگەی ئاڵتوون کۆپری، سەرچاوەکانی نەوتی لێیە، کە گەلێك زۆرە و لە کۆندا لەلایەن ئیکەزنەفۆنەوە ناوی براوە..."[٦١].

لە ١٦ تشرینی یەکەم (١٨٨٥)گەریدە هنری بندیە دەگاتە ناوچەکانی شاری موسڵ وئاماژە بەوە دەکات کە بەچاوی خۆی ماددەی زفت و قیری بینیوە لە ناوچەکەدا، بۆ نەوتی خاویش دەڵێت: " لەسەر کەنارەکانی رووباری دیجلە، کە بە زۆربەی ناوچەکانی دۆڵی میزۆبۆتامیا تێدەپەڕێت، سەرچاوەی نەوت و قار بوونی هەیە..."[٦٢].

بە هۆی گرنگی کەرکوك لە رووی ئیداری وجوگرافی و ئابووری و سیاسییەوە[٦٣]، دەوڵەتی عوسمانی بە چاوێکی پڕ بایەخەوە تەماشای کەرکوکی کردووە، بەردەوام هەوڵی داوە دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێت لەم شارەدا، بۆیە دەسەڵاتدارانی عوسمانی دەستیان کرد بە پاڵپشتیکردنی هەندێك بنەماڵەی دەوڵەمەند لە شاری کەرکوك، کە چەندین پلەی گرنگ وئیمتیازی تایبەتی پێی سپێردرا بوون[٦٤]، لەو بنەماڵانەش کە ئیمتیازی نەوتی باباگورگوریان پێ سپێردرا بوو، بنەماڵەی نەفتچی زادە بوو[٦٥]، بەفەرمانێکی هەمایونی ساڵی(١٨٧٢)[٦٦]، بۆ دەرهێنانی نەوت لە کێڵگەکانی باباگورگور. ئەم بنەماڵەیەش بە هۆکاری ساکار دەستیان کرد بوو بەدەرهێنانی نەوت و ئاڵوگۆڕی بازرگانی ناوشاریان پێکرد، تەنانەت هەندێك جار بۆ شاری بەغداش رەوانەیان دەکرد[٦٧].

بە کارهێنانی نەوت لە کەرکوك و ناوچەکانی تری عێراق لەبواری تەسکدا بووە، نەیانتوانیوە کەڵکی زۆری لێوەرگرن، بەکارهێنانەکەش بە شێوەکی سادە و ساکار بووە. ئامرازی ئاوکێشانی وەکو کوندەو مەشکە و گۆزە و تەنەکە بەکاردەهێنرا بۆ دەرهێنانی نەوت، لەسەر پشتی وڵاخەکانیان گواستویانەتەوە[٦٨]، بەڵام هیچ شێوازێکی نوێ بەکارنەهێنرا بۆ گەشەسەندنی نەوت و پاڵوتنی لەم ناوچەیەدا، تاکو دامەزراندنی مدحەت پاشا وەك والیی بەغدا(١٨٦٩-١٨٧٢)، بەیارمەتی هەندێك لە پسپۆرانی ئەڵمانیی پاڵاوتنی نەوت لە بەعقوبە دامەزرا، بۆ پاڵاوتنی نەوتی دەرهاتوو لە ناوچەی مەندەلی[٦٩]، هەروەها لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٩دا، هەوڵی گەشەسەندنی کێڵگەکانی نەوتی گەیارە درا لەلایەن پسپۆرانی فەرەنسا و هەوڵی زیادکردنی بەرهەمی هەردوو ناوچەی خورماتوو و باباگورگور درا[٧٠].

بەپێی ئەو راپۆرت و زانیارییانەی کە گەریدە و پسپۆران لەسەر ئەو ناوچەیە تۆمار کرابوو، وڵاتانی ئەورووپی بەتایبەتی(ئەڵمانیا و بەریتانیا) وڵاتانی تر، کە خوازیاری سیاسەتی بە کۆلۆنیالکردنی ناوچەی رۆژهەڵات بوون، دەستیان کرد بەناردنی تیم وشاندی پسپۆری دیکەی تایبەت بۆ گەران بەدوای دۆزینەوەی نەوت و دەست نیشانکردنی ناوچە نەوتییەکانی لە ویلایەتی موسڵی عوسمانی وکەرکوك بەتایبەتی. لە ساڵی(١٨٧١) یەکەم تیمی ئەڵمانی سەردانی ناوچەکە دەکا، هەروەها هەردوو ویلایەتی موسڵ و بەغدا یان پشکنی، راپۆرتێکیان پێشکەش کردبوو، تیایدا ئاماژەیان کردبوو، کە نەوت بە رێژەیەکی زۆر لەو ناوچەیەدا هەیە[٧١]، بەڵام لە هەمان کاتدا ئاماژەیان بەوەکردووە، کە بە نەبوونی هێڵی گواستنەوەی نەوت بۆ سەر کەنارەکانی دەریای ناوەراست، هیچ کۆمپانیایەکی نەوت ناتوانێت لە دەرهێنانی ئەم نەوتانە سەرکەوتوو بێت، ئەگەر بیەوێت کێبرکێی نەوتی ئەمەریکا و روسیای پێبکات[٧٢].

* سەرچاوە و پەراوێزەکان:-

١) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:عزیز حسن الخفاف:المصدر السابق، ص١٩-٢٠;میربصري:مباحث في الإقتصاد العراقي، بغداد، ١٩٤٨، ص٥٧-٥٨.

٢) بڕوانە:ریتشارد سیلي: اساسیات جیولوجیا البترول، ت فاضل السعدني، الاردن، ١٩٩٤، ص;١صلاح نعمان عیسی:المصدر السابق، ص٦.

٣) بڕوانە، میربصري: المصدر السابق، ص٧٤.

٤) بایزید حسن: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٩.

٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل;١٩هەروەها عبدالحمید العلوجي وخضیر اللامي:المصدر السابق، ص٣٨.

٦) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:طه باقر: النفط في ....، ص٣.

* شارێکی بەناوبانگی سۆمەرییەکان لە دۆڵی ڕافدێن.

٧) عبدالحمید العلوجي وخضیر اللامي:المصدر السابق، ص٣٨.

(٨) المصدر نفسه، ص٣٨ .

(٩) بۆزانیاری زیاتر دەربارەی بەکارهێنانی نەوت وشێوەکانی لەلایەن بابلییەکان بڕوانە: عبدالحمید العلوجي وخضیر اللامي:المصدر السابق، ص;٣٩هارڤی اوکونور:المصدر السابق، ص٣٧.

(١٠) العهد القدیم، سفر نبی دانیال-فصل ٣.

(١١) بۆ زانیاری زیاتربڕوانە: عبدالحمید العلوجي وخضیر اللامي:المصدر السابق، ص٤١-٤٢.

(١٢) المصدرنفسه، ص٤٣.

(١٣) العهد القدیم، سفر تکوین-فصل٦-ص٨.

(١٤) العهد القدیم، سفر تکوین-فصل١١-ص١٣.

(١٥) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبدالحمید العلوجي وخضیر اللامي:المصدر السابق، ص٤٩-٥١.

(١٦) (Greek fire): ئەم ئاگرە پێکهاتبوو لە هەندێك مادده، کە خێرا گردەگرێت وەك نەوت و قیر و کبریت هەندێکك جۆری دیکە لە نێو پارچە قوماشێکی کەتان داخراو بە ئاگرەوە یان بە تۆپلە لە ناو لوولەیەکی کانزایی دەهاوێژرا، ئەو ئامێرەی ئەم جۆرە ئاگرەی دەهاوێژت بە زمانی عەرەبی پێی دەڵێن (النفاطه او الزراقه)، هەروەها بە تیر یان مەنجەنیقیش بەکاریان هێناوە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محسن محمد:الجیش الایوبي في عهد صلاح الدین، اربیل، ٢٠٠٢، ص١٨١.

(١٧) بڕوانە: ابن الاثیر:الکامل في التأریخ، ج٣، دار الکتب العلمیة، بیروت، ٢٠٠٦، ص ص٤٦٣-٤٦٤.

(١٨) احمد سویلم العمری: صراع البترول في العالم العربي، د.م، ١٩٦٠، ص٧.

(١٩) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:ابي جعفر بن جریر الطبري: تأریخ الطبري، ج٤، بیروت، ٢٠٠٥، ص٦٦٣.

(٢٠) عبدالحمید العلوجي: نصوص نفطیة من التراث العربي، مجلة العاملون في النفط، بغداد، العدد٤٤، تشرین الاول ١٩٦٥، ص ص٢٢-;٢٣ هەروەها بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ڕۆڵی نەوت لە ناکۆکی نێوان ئەمین ومەموون، بڕوانە: ابي جعفر بن جریر الطبري: المصدر السابق، ج٥، ص٧٤.

* جەنگی عەمووریە(٢٢٣ك) لەنێوان خلیفەی موسوڵمانەکان(موعتەسەم) و پاشای ڕۆم(تۆفیل میخائیل) ڕووی دا، هەروەها لەم جەنگەدا موسڵمانەکان سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، لە کردنەوەی شاری عەمووریە، تەنانەت سەرچاوەکان دەڵێن نزیکەی ٣٠هەزار لە ڕۆمەکان کوژراون، بڕوانە:جلال الدین السیوطي، تأریخ الخلفاء، بیروت، ٢٠٠٤، ص٢٩٢.

(٢١) بڕوانە:محمد هادي الدفتر و عبدالله حسن، المصدر السابق، ص١٩٥.

(٢٢) بڕوانە:محسن محمدحسین: المصدر السابق، ص١٨٥.

(٢٣) بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی بوونی نەوت لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان وبەکارهێنانی ئەم کەرەستەیە لەلای دانیشتووانی، بڕوانە:عەبدوڵلا غەفور: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩.

(٢٤) حکمت سامی سلیمان:المصدر السابق، ص;٦٠ کمال مجید:النفط والاکراد، ط٢، لندن، ١٩٩٧، ص١٩.

(٢٥) بڕوانە:محمد هادي الدفتر و عبدالله حسن، العراق الشمالي، ج١، بغداد، ١٩٥٨، ص;١٩٣ عبدالرزاق الهلالي:معجم العراق، ج٢، بغداد، ١٩٥٦، ص;٦ میر بصري:المصدر السابق، ص;٧٣نوري عبدالحمید خلیل: التأریخ السیاسي لامتیازات النفط في العراق(١٩٢٥-١٩٥٢)، بیروت، ١٩٨٠، ص;١٩ عبدالفتاح ابراهیم:علی طریق الهند، بغداد٢٠٠٤، ، ص١٧٧.

** چەرموو بە کۆنترین نیشتەجێی کشتوکاڵی و جوتیاری چاخی بەردینی نوێ لەقەڵەم دەدرێت.

(٢٦) روفائیل میناس:الناروالنفط-الغاز والکبریت في کرکوك، مجلة الاخاء، العدد٩-١٠، بغداد، ١٩٨٢، ص١٣.

(٢٧) عبدالحمید العلوجي وخضیر اللامي:المصدر السابق، ص٣٦.

(٢٨) عزیز حسن الخفاف:المصدر السابق، ص٢٠.

(٢٩) میر بصري:المصدر السابق، ص;٥٧ نوري عبدالحمید خلیل:المصدر السابق، ص١٩.

(٣٠) لە ڕاستیدا نەوت لە قووڵاییەکی زۆر لە ژێر زەویدا لەنێوان چینە بۆشاییەکانی و بەردینەکاندا، ناسراوە بە مەیدانی نەوت لە ناوچەی یەکەم، زۆر جار پێدزە دەکات بۆ ناو خانە و شەقرەکانی چینەکانی زەویدا، جێگیر دەبێت لە ناوچەیەکی تر پێی دەڵێن ناوچەی پلە دووەم، بەڵام بە یارمەتی قورسایی چینەکانی زەوی و فشاری گازەکانی ناوچەکەدا نەوت دزەدەکات، نزیك دەبێتەوە لە ئاستی زەویدا، وەك ناوچەکانی(باباگورگور)، لە کەرکوك و مەسجدی سلێمان و ناوچەی شووش لە باشووری ڕۆژئاوای ئێران و هەندێك ناوچەی تر وەك خانەقین و مەندەلی و خوورماتوو و کفری ...هی تر، هەر ئەم هۆکارەش وایکردووە ئاگرێك لە گازی سروشتی بەرز بێتەوە لەم ناوچانەدا، بەتایبەتی لە ناوچەی باباگورگور، ئەوەی سەرسورهێنەرە لە کێڵگەکانی باباگورگوردا، ئەوەیە(ئەگەر بە پەنجەکانی دەست یاخود بەهەر هۆکارێکی تر خاکەکەی هەڵکۆڵین دەبینین یەکسەر

ئاگر دەردەچێت لە شوێنێکی تر، ئەگەر بەری بگری بەخۆڵ ئەوە لەجێگەی تر سەر هەڵ دەدات، ئەو خاکەش، کە ئەم ئاگرەی لێدەردەچێت پێکهاتووە لە گۆگرد و گازی سروشتی و نەوت هەر ئەم ئاگرەش بوو ئاشکرای کرد، کە نەوت لە دێرزەمان لەم ناوچەیەدا بوونی هەیە، بڕوانە: محمد هادي دفتر وعبدالله حسن:المصدرالسابق، ص;١٩٤ حكمت سامي سليمان:المصدر السابق، ص;٦٠ صلاح نعمان عيسى:المصدر السابق، ص;١١ كمال مجيد:المصدر السابق، ص١٩.

(٣١) عبدالحميد العلوجي وخضير الامي: المصدر السابق، ص;٣٥ازاد نقشبندي:(اثر نفط كركوك على ترحيل الكرد من كركوك وتعريبها)، بحوث المؤتمر العلمي حول كركوك، اربيل، ٢٠٠١، ص٣٠

(٣٢) المصدر نفسه، ص٣٨.

(٣٣) جمال رشيد:( كركوك في العصور القديمة)، بحوث المؤتمر العلمي حول كركوك، اربيل، ٢٠٠١، ص٦١.

(٣٤) لە گەڕانەوەمان بۆ کتێبی تەورات (العهدالقديم) لە گەشتی دانیال پێغەمبەر لە بەشی سێهەم ودوازدەهەم چەندین جار باس لە ئاگرێکی ئەزەلی(اتون النار المتقدة) دەکات، کە لە ئاخەوتنی نێوان خۆی ونەبوخەزنەسەر دووبارە دەبێت، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە العهد القديم، سفر نبی دانیال-فصل٣و١٢، هەندێك سەرچاوە ئەم ئاگرەی لە گەشتەکەی دانیال پێغەمبەر هاتووە، بە ئاگری ئەزەلی باباگوڕگوڕ ناوی دەبن، بڕوانە: عبدالرزاق الحسني:عراق قديماً وحديثاً، ط٣، صيدا، ١٩٥٨، ص;٢٢١ عزيز حسن الخفاف:المصدر السابق، ص;١٩ س.جي.ادموندز: كرد وترك وعرب، ت/جرجيس فتح الله، بغداد، ١٩٧١، ص٢٤٠ ; ازاد نقشبندي:المصدر السابق، ص٣٠ .

(٣٥) جەمال ڕەشید ئەحمەد:کەرکوك و ناوچەی گەرمیان وماڤی کۆنتڕۆڵ کردنیان لەلایەن کوردەوە، دهۆك، ٢٠٠٨، ل٢٩.

(٣٦) عبدالحميد العلوجي وخضير اللامي:المصدر السابق، ص٣٥.

(٣٧) عبدالفتاح ابراهيم:المصدر السابق، ص١٧٧.

* هێروودوت مێژوونووسی گەورەی یۆنانی، کە ناسراوە بە(باوکی مێژوو) گەشتێکی کردووە بە ناوچەکانی جیهاندا و کۆمەڵێك زانیاری جوگرافی و مێژوویی گرنگی کۆکردووتەوە لە پەرتوکیدا، بە گرنگترین ژێدەری مێژوویی هەژماردەکرێت.

(٣٨) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: س.جي.ادموندز:المصدر السابق، ص;٢٤٠هەروەها، جرجيس فتح الله: (كركوك النزاع حول تكوينها الاثني ومحاولة تعريبها)، بحوث المؤتمر العلمي حول كركوك، اربيل، ٢٠٠١، ص٢٤٤.

(٣٩) ئەربخا-Arpahi یان لە تۆمارەکانی بتلیموس بەم شێوەیە هاتووە(Arrhapa) بە پێی سەرچاوە مێژووییەکان کەرکوك ناوی زۆری لێنراوە ئەمەش یەکێك بووە لەو ناوانە، ئێستاش لە کەرکوك ئەم ناوە بە کاردێت ناوی گەڕەکێکە (عەرفە) نزیك کۆمپانیای نەوتی کەرکوکە.بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د.جمال رشيد: كركوك في العصور القديمة...، ص٧٥.

(٤٠) جمال ڕەشید ئەحمەد:کەرکوك و ناوچەی گەرمیان...، ل٣٠.

(٤١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠.

(٤٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: هاشم عاسی سەعید: کرکوك و کوردستان و چەند سەرچاوەیەك، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە٤، ساڵی ٢٠٠٣، ل ل٧٢-٧٣.

(٤٣) بڕوانە، عبدالحميد العلوجي وخضير عباس اللامي:المصدر السابق، ص٣٨.

(٤٤) يوسف ابراهيم يزبك: المصدر السابق، ص٢٥.

(٤٥) عەبدوڵڵا غەفور: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩.

(٤٦) بڕوانە:محمد هادي الدفتر و عبدالله حسن، المصدر السابق، ص١٩٣.

(٤٧) کەرکوك نزیکەی چوار سەدە لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی مایەوە، هەروەها کەوتە ژێر کاریگەری ململانێی عوسمانی و سەفەوی تاکو سەدەی هەژدەهەمدا، بەتایبەتی لە دوای داگیرکردنی سەفەوی دووەم بۆ بەغدا لە ساڵی ١٦٢٣ لەلایەن شا عەباسی گەورە(١٥٨٨-١٦٢٩) بۆیە کەرکوك کەوتە ژێر کۆنتڕۆڵی داگیرکەری سەفەوی(١٦٢٣-١٦٢٤)، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:سعدی عثمان حسين:كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشروالثامن عشر، السليمانية، ٢٠٠٦، ص٢٨٤-٢٨٥. لە کاتی داگیرکردنی کەرکوك لەلایەن هێزی فارسییەوە تاوانی کوشتن وتاڵانی ودزی وێرانکردن وکاولکردن لە شارەکە ئەنجام درا، بۆ ماوەی دووجار لە نیوەی یەکەمی سەدەی ١٨دا، یەکەمیان لە ساڵی ١٧٣٣و دووەمیان لە ساڵی ١٧٤٣بوو، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: علي شاكر علي:تأريخ العراق في العهد العثماني ١٦٣٨-١٧٥٠، الموصل، ١٩٨٤، ص ص ١٨٤-١٩٦.

(٤٨) صلاح الدين انور قيتولي: كركوك في حقبة الصراع الصفوي والعثماني حتى الحاقه بالملكة العراقية(١٦٣٨-١٩٢٤)، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە١، ٢٠٠٤، ل١٦٥.

(٤٩)م.ئوتەر(M.Oter) لە ساڵی(١٧٤٣) زانیارییەکانی لە ناو کتێبێك بڵاودەکاتەوە بە ناوی(گەشتێك لە تورکیا و ئێراندا)، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبدالحميد العلوجي وخضير اللامي:المصدر السابق، ص٦٣.

(٥٠)رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر، ت/مەحموود حسين الامين، بغداد، ١٩٦٥، ص٨٦.

(٥١)المصدر نفسة، ص ص٨٣-٨٤.

(٥٢)لە ساڵی(١٧٧٩)دا گەڕیدەی فەرەنسی م.د.. دانفیل(M.D.Danville) سەردانی هەموو ناوچەکانی مێزۆپۆتامیا دەکات، لەگەشتەکەیدا هەموو زانیارییەکانی تۆمارکردووە بەناونیشانی(گەشتێك دەربارەی فورات ودیجلە )، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبدالحميد العلوجي وخضير اللامي:المصدر السابق، ص٦٤.

(٥٣)المصدر نفسة، ص٦٤.

(٥٤)رحلة اوليفييه الى العراق ١٧٩٤-١٧٩٦، ت/يوسف حبي، بغداد، ١٩٨٨، ص٦٧.

(٥٥) لەسەردەمی والی بەغدا سلێمان پاشای

گەورە(١٧٨٠-١٨٠٢)ی مەملوکی، ڕێگادرا بە ژمارەیەکی زۆر لە گەریدەی بیانی و ئینگلیزی بە ئازادی هاتووچۆو بکەن، لە ناو عێراقدا بەبێ سنوور، لەسەروی ئەمانەو ج.جاکسون(J.Jackson)ی ئینگلیزی بوو، کە دانیشتووانی شاری کەرکوك بە چاووی خۆیان لە ٢٤ تەموزی(١٧٩٧) لە شاری کەرکوك بینراوە، گەشتی وردی بە ناو شارەکەدا کردووە، بروانە: ج.جاکسون: مشاهدات بريطاني عن العراق سنة ١٧٩٧، ت/خالد فاروق عمر، لبنان، ٢٠٠٠، ص١١.

* فەرمانبەرێکی بە ناوبانگی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتە (English East India Company)، گەشتێك دەکات بۆ هەموو ناوچەکانی عێراق، بروانە: جمس بکنغهام: رحلة الى العراق، ت/سليم طه التكريتي، ج١، بغداد، ١٩٦٥، ص١٤٣.

(٥٦)المصدر نفسه، ص١٤٣.

** کلودیوس جیمس ریچ(C.J. Rich) نوێنەری کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵات(English East India Company) دەبێت، هەروەها نیشنگەی بەریتانیا بووە بەردوام لە بەغدا لەنێوان ١٨٠٨-١٨٢١، بۆ زانیاری زیاتر بروانە: كلوديوس جيمس ريچ: رحلة ريض في العراق عام ١٨٢٠، ت/بهاءالدين نوري، ج١، بغداد، ١٩٥١، ص٢٠.

*** یەك حۆقە دەکاتە ٢، ٥ باتمان، بەپێوەری ئینگلیزی(٠,٥٦٨ لتر دەکات)، المصدر نفسه، ص٢١.

(٥٧) كلوديوس جيمس ريچ: المصدر السابق، ص ص٢٠-٢١.

(٥٨) محمد بن احمد الحسيني المنشي البغدادي:رحلة المنشي البغدادي الى العراق، ت/عباس العزاوي، بيروت، ٢٠٠٨، ص٧٨.

(٥٩) عەزیز شەمزینی: جوڵانەوی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان، و/فەرید ئەسەسەرد، چاپی٤، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٢٥

(٦٠)بەختیار سەعید مەحمود: کەرکوك لە سەدەی نۆزدەهەمدا (لێکۆڵینەوەیەکی ڕامیاری و ئابووری)، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل١٧٦.

**** ژاك ڕێتۆرێ(١٨٤١-١٩٢١) گەریدەی فەرەنسی سەردانی ناوچەکانی کوردستانی باشووری دەکات و هەواڵی گەشتەکەی لە ناوچەی کەرکوك و سلێمانی لە (١٨٧٩-١٨٨٠)، لە گوتاری (ساڵنامەی دۆمینکان) بەزمانی فەرەنسی بڵاوکردووتەوە...، بروانە: ژاك ڕێتۆرێ: گەشتنامەی مسیۆنێریك بۆ ناوچەکانی کەرکوك وسلێمانی، ور/ نەجاتی عەبدوڵڵا، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٣٣.

(٦١) بروانە: هەمان سەرچاوە، ل٣٣.

(٦٢) هنري بنديه: رحلة الى كردستان في بلاد مابين النهرين سنة ١٨٨٥، ت/يوسف حبي، اربيل، د.ت، ل٩٨.

(٦٣) کەرکوك بەدرێژایی مێژووی جێگای چاوتێبرینی داگیرکەربووە، لەلایەن ئەو هێزو دەسەڵاتدارانە کە بەردەوام لە هەوڵی چەسپاندنی دەسەڵاتیاندا ببوون لەسەر ئەم شارە، هۆکارەکەش دەگەرێتەوە بۆ پێگەی گرنگی ئەم شارە، کە لەسەر ڕێگای ستراتیژی بووە، ناوچەکانی دەریای ڕەش وناوەڕاست دەبەستێتەوە بەکەنداوە وڕێگای کۆنی ئاوریشم(حرير) بەروو ئاسیای ناوەراست وچین دا، هەروەها دەوڵەمەندی ئەم شارە لەلایەن ئابووریدا، هۆکارێکی تربووە بەتایبەت هەبوونی نەوتێکی زۆر.بۆ زانیاری زیاتر بروانە: جبار قادر: التركيب الاثني لسكان كركوك خلال قرن(١٨٥٠-١٩٥٨)، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(١٥)، ٢٠٠٣، ل١٧٩.

(٦٤) بەختیار سەعید مەحمود: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣.

(٦٥) هەندێك سەرچاوە ڕەچەڵەکی ئەم بنەماڵەیە بۆ کورد دەگەرێنەوە، ئەوەتا سی.جی.ئەدمونز دەڵێت"بنەماڵە ناودارە ئەرستقراتییەکان لە کەرکوك یان تورکن یان خۆیان بە تورك دادەنێن، بەڵام ڕەچەڵەکیان کوردە سەر بە هۆزی زەنگەنەن، وەك بنەماڵەی نەفتچی زادە: بۆ زانیاری زیاتر بروانە: سی جی ادمونز: المصدر السابق، ص;٢٤١هەروەها مستشرقی سۆڤیەتی البرت منتشاشفیلی دەڵێت"بەشێك لە بنەماڵە ئەرستقراتییەکانی شاری کەرکوك لە ڕەچەڵەکی کورد بوونە، هەرچەندە خۆیان بەتورك دادەنێن وەك نەفتچی و یەعقوبی زادە، کە دەگەرێنەوە سەر خێڵی زەنگەنە کوردی..."بۆ زانیاری زیاتر بروانە: ا.م.منتشاشفیلی:کورد، و/عیزەدین مستەفا رەسوول، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٤٨.

(66) بروانە، دڵشاد عمرعبدالعزيز: نەوتی کەرکوك وململانێی زلهێزەکان(١٨٩٠-١٩٢٧)، نامەی ماستەر، کولێجی زانستە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠١٠، پاشکۆی ژمارە(٤). هەروەها هەندێکی سەرچاوە ئیمتیازی نەوت لەلایەن عوسمانییەکانەوە بۆ بنەماڵەی نەفتچی زادە دەگەرێننەوە بۆ ساڵی ١٦٣٩، بەڵام لە ڕاستیدا نە خۆیان وێنەی ئەم بەڵگەنامەیان دەست نەکەوتوە، نە هیچ سەرچاوەیەکی مێژووی تر ئاماژەی پێ کردووە، بۆ زانیاری زیاتر بروانە: اوقات عطا ترزي باشي:كركوك بترول تاريخي، قارداشلق، العدد ٣، بغداد، ١٩٦١.

(٦٧) مير بصري، المصدر السابق، ص;٧٤ عبدالحميد العلوجي وخضير اللامي:المصدر السابق، ص;٦٨ ازاد نقشبندي: اهمية حقول كركوك النفطية، مجلة متين، العدد ٦٦، ص١٠٩.

(٦٨) عەبدوڵڵا غەفور: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩.

(٦٩) نوري عبدالحميد خليل:المصدر السابق، ص١٩.

(٧٠) محمد عصفور سلمان: العراق في عهد مدحت باشا١٨٦٩-١٨٧٢، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية الاداب جامعة بغداد، ، ١٩٨٩، ص;١٧٢ .S.H Longrigg. op.cit p.14

(٧١) بروانە:الحزب الديمقراطي الكردستاني (المكتب السياسي)مكتب الدراسات والبحوث المركزي:نفط كوردستان العراق، ج١، ط١، هەولێر، ١٩٩٧، ص١٢ :S.H.Longrigg op. cit. pp13-14 ;

(٧٢) عبد الرزاق الحسني:العراق قديما وحديثا...، ص;٤ عبدالحميد العلوجي وخضير اللامي:المصدر السابق، ص ٧٠.

## * نەوتی كەركوك لەنێوان زەوتكردنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و گەورە هێزەكاندا ( ١٨٩٠-١٩٠٨)ز

د. دڵشاد عومەر عەبدولعەزیز

لە حەفتاكانی سەدەی نۆزدەهەم، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تووشی كۆمەڵێك كێشەی سیاسی و سەربازی و ئابووری جیاجیا بوو، بە جۆرێك گەیشتبووە ئاستی ئابووت بوون، هەموو سەرچاوەكانی داهاتی كەوتبووە ژێر كۆنترۆڵ و دەستێوەردانی زلهێزەكان، بووبووە ئامانجی هاتنەناوەوە و دەستێوەردانی زلهێزەكان لە ڕێگای سیستەمی ئیمتیازی بیانی(Capitulations) و پێدانی قەرز و ئیمتیازی هێڵی شەمەندەفەر، ئیمتیازی هاتووچۆی دەریایی، پرۆسەی وەبەرهێنانی سەرمایەو بانكەكانەوە[١]. بانكی عوسمانی* كە بانكێكی هاوبەش بووە لەنێوان فەرەنسا و بەریتانیا لە ساڵی١٨٦٣ چالاك تر بووە بۆ ناردنی سەرمایە بۆ ئەو ناوچانەی لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بوون. هەروەها لە دوای كردنەوەی چەندین لق لە ناوچە جیاجیاكانی دەوڵەتی عوسمانی، لە ساڵی١٨٩٣ لە ویلایەتی بەغدا لقێكی ئەم بانكە كرایەوە، لە ساڵی ١٨٩٤ لە ویلایەتی (موسل)یش لقێك كرایەوە، هەروەها ئەم بانكە ئیمتیازاتی فراوان و گرنگی دارایی لە هەموو بوارەكاندا لە ناو دەوڵەتی عوسمانیدا پێدرا، گرنگترین ئەو ئیمتیازانەش پرۆژەی هێڵی ئاسنین بوو[٢]. حكومەتی هیندی - بەریتانی كە لە دوای كۆمپانیای (هیندی ڕۆژهەڵات) نوێنەرایەتیی سیاسەت و ستراتیژیەتی بەریتانیای دەكرد لە ناوچەكەدا، بەردەوام سەرمایەی بەریتانی لە عێراق بڵاودەكردەوە، ئەمەش تەنها لە بەر داگیركردنی ناوچەكە بوو، بە بیانووی ئەوەی عێراق كەوتووەتە سەر ڕێگای هیند و بڕێكی زۆریش نەوتی هەیە[٣].

ئەو كێشە قورسانەی تووشی لایەنی دارایی دەوڵەتی عوسمانی هاتبوو، بارودۆخی دەوڵەتی زیاتر ئاڵۆز كردبوو، بۆیە دەبینن دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی عوسمانی بیریان لە دەوڵەتی ئەڵمانی كردەوە، خۆیان لێ نزیك كردەوە، لە بەر ئەوەی هیچ متمانەیەكیان بە بەریتانیا وفەرەنسا و رووسیا نەمابوو و بۆ ئەوەی لە دژی پیلانەكانیان بوەستێتەوە[٤]. هەروەها لە ئەنجامی ئەو گۆڕانكارییە سیاسییانەی لە دوای كۆنگرەی بەرلین(١٨٧٨) بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا هاتبوو، سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم خۆی لە بەردەم دوو كێشەی سەرەكیدا بینیوە، یەكەمیان مایەپووچ بوونی خەزێنەی دەوڵەت بوو، كە پێویستی بە بناغەیەكی دارایی جێگیر هەبوو، دووەمیان سوپای عوسمانی هەستی بەوە دەكرد زۆر پێویستی بە راوێژ و ئامۆژگاری ڕۆژئاوایە، سوڵتان باوەری وابوو هاوكاریكردنی ئەڵمانیا ئەم كێشانە چارەسەر دەكات[٥]. بۆیە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم نێردەیەك بە سەرۆكایەتی(عەلی نەزمی) دەنێرێت بۆ بەرلین تەنها بۆ هاندانی سەرمایەدارەكانی ئەڵمانیا، بۆ ئەوەی بۆ دروستكردنی كۆمپانیایەك بۆ راكێشانی هێڵی ئاسنینی بە ناوچەكانی دەوڵەتی عوسمانیدا رازییان بكات، لە بەرامبەر ئاسانكاری زۆر لەلایەنی دەوڵەتی عوسمانییەوە[٦].

ئەڵمانیا دەوڵەتێكی بەهێزی ئەورووپا بوو، لە نیوەی سەدەی نۆزدەهەمەوە لە ڕووی سەربازی و ئابوورییەوە دەركەوت، هەروەها لە دوای ئەنجامدانی یەكێتی ئەڵمانیا لە ١٨٧١ دا بەهێزتر بوو، كە كاریگەری هەبوو لەسەر پێشكەوتن و گۆڕانكارییان لە ئەورووپا[٧]. ئەڵمانیا لە سەردەمی گەشەسەندن و پەرەسەندنی ئابووری و پیشەسازیدا دەژیا، دەوڵەتێكی نەتەوەیی بوو كە لایەنگر وپشتگیری لە ئابووری نیشتمانی و پیشەسازی دەكرد. لە گرنگترین نیشانەكانی پێشكەوتنی ئابووری ئەڵمانیا لە بواری پیشەسازی و بازرگانی دەرەوە و بانكەكان و سەرمایەی نیشتمانیدا بوو. لەنێوان ساڵانی ١٨٤٨-١٨٦٤ بەرهەمی خەڵوزی بەردین لە ئەڵمانیا دووجابوو، هەروەها بەرهەمی ئاسن سێ جار وچوارجار بوو لەنێوان ساڵانی ١٨٦٠-١٨٧٠، پیشەسازییە قورسەكانی ئەڵمانیا بەرزبوونەوەیەكی چۆنایەتی نوێیان تۆماركرد لە ساڵانی ١٨٧٩-١٨٨٢، هەروەها بازرگانی دەرەوە لە ئەڵمانیا گەشەی سەند بەتایبەتی لەنێوان ساڵانی١٨٧٥-١٩٠٠. بەڵام پێشكەوتنی ئەڵمانیا لە بواری تۆڕی هاتووچۆی ئاسنین، سێ جار زیادی كرد لە ساڵانی ١٨٥٠-١٨٧٠و درێژەی هەبوو بە ١٩، ٥٠٠كم، ئەمجۆرە تۆڕانەی هاتووچۆی ئاسنین لە ئەڵمانیا تەنها هاوشێوەی لە ئەمریكا و بەریتانیادا هەبوو[٨].

شانبەشانی ئەم پێشكەوتن و گەشەسەندنە بەرچاوەی لە كەرتی بانكەكان ڕوویان دا، بانكی گەورە دروستبوون وەك بانكی (دیسكاونت گێزێلشافت-Discount Gesellshaft) لە بەرلین ١٨٥١، دارمشتادتر بانك (Darmstadter bank) لە ساڵی ١٨٥٣، هەروەها (بەرلین هاندلر گێزێلشافت-Berlin Handler Gesellschaft) لە ساڵی ١٨٥٦ لەگەڵ (دۆیچە بانك-Deutsche Bank) لە ساڵی ١٨٧٠، هەروەها (درێسدنەر بانك-Dresdner bank) لە ساڵی ١٨٧٢. ئەم بانكانە لە پاڵ كارەكانی خۆیان پرۆژەی داراییان لە دەرەوەی وڵاتاندا جێبەجێ دەكرد، بوونی ئەم بانكانەش قەبارەی سەرمایەی ئەڵمانیای بۆ دەرەوەی وڵات زیاد كرد، لە ساڵی١٨٩٤ تاكو ١٩٠٠ لە ٥٠٠ بۆ ٦٠٠ ملیۆن ماركی ئەڵمانی ساڵانە زیادی كرد[٩].

بەڵام ئەم پێشكەوتنانە بەتایبەتی لە بواری ئابووریدا، ئەڵمانیای خستە ژێر كۆمەڵێك تەنگژەی ئابووری و داراییەوە لە ساڵانی ١٨٧٢-١٨٩٥ لەگەڵ زیادبوونی ڕێژەی دانیشتووان، ئەم كێشانە بوونە هۆی بەرزبوونەوەی داخوازی لە ناوخۆی ئەڵمانیا بۆ بەهێزكردنی هەناردەكان و كاركردن بۆ سیاسەتێكی كولۆنیالی گورجوگۆڵانە، بۆیە دەوڵەتی عوسمانی و ڕۆژهەڵات بەگشتی بووە ناوچەیەكی چالاكی بۆ چارەسەركردنی كێشە ئابوورییەكانی ئەڵمانیا[١٠]، هەروەها خاوەن دەسەڵات و سەرمایەدارەكان كاریان بۆ جێبەجێكردنی پلانەكانی ژەنەراڵ فون مۆڵتكە** كرد، ئەویش بۆ دامەزراندنی هێڵی ئاسنین.

قەیسەری ئەڵمانیا (ولیەمی دووەم–Wilhlem II) ١٨٨٨–١٩١٨ بە پێویستی زانی پەیوەندییەکانی نێوان ئەڵمانیا ودەوڵەتی عوسمانی بەهێز بکا، باوەڕی وابوو ئەم پێوەندیانە چارەسەری کێشە ئابوورییەکانی ئەڵمانیا دەکەن، بۆیە چاویان بریە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی و ڕۆژهەڵات بە گشتی، لە ڕێگای هاندانی تیمە زانستییەکانی شوێنەوار وگەڕان بە دوای نەوت و هاندانی سەرمایەی ئەڵمانی بۆ ناو دەوڵەتی عوسمانی، بۆ ئەم مەبەستە بانك و کۆمپانیای گەورە دامەزرێنرا، لەگەڵ دامەزراندنی هێڵێکی گواستنەوەی دەریایی لەنێوان ئەستەنبوڵ و هامبۆرگ، ئەم سیاسەتە نوێیەی ئەڵمانیا لە نزیکبوونەوە لە دەوڵەتی عوسمانی ناسرا بە "ئاراستە بەرەو ڕۆژهەڵات"[11].

بەم پێیە هاوپەیمانیەتی و دۆستایەتی لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئەڵمانیا لەسەر حیسابی خاك ومیللەتانی ناو قەوارەی دەوڵەتی عوسمانی دروست دەبێت. بەرژەوەندییەکانی ئەڵمانیا بۆ جێبەجێکردنی ئەم پرۆژیە دوو ئامانجی هەبوو، یەکەمیان دەیویست بەرژەوەندیی ئابووری دەستکەوێت، دووەمیان بۆ ئەوەی بە کەنداوی فارس بگات و کۆنترۆڵی ڕێگای ڕووباری دیجلە و فورات و ناوچەی ڕۆژهەڵات بە گشتی بکات، بەڵام بەرژەوەندیی تایبەتیی بەریتانیا وفەرەنسا و هۆڵەندا و ئەمریکا ئاڵۆزبوو لە ململانێ وکێبڕکێ لەسەر ئیمتیازی تۆڕەکانی هێڵی ئاسنی و ئیمتیازی نەوت لە ناوچە دواکەوتەکانی دەوڵەتی عوسمانی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەڵام لە ڕاستیدا ململانێی سەرەکی لەنێوان کۆمەڵێك کۆمپانیای ئەڵمانی و فەرەنسی و بەریتانی و هۆڵەندی و ئەمریکی بوو، کە بە وردی چاویان لە گرنگی گەورەی ئیمتیازی هێڵی ئاسنی ئەنادۆڵ و هێڵی ئاسنی بەغدا بوو. هەروەها ململانێ و کێبڕکێی زلهێزەکان بۆ بەدەستهێنانی ماف بەکارهێنانی سەرچاوە نەوتییەکان، بە تایبەتی لە ناوچەی ویلایەتی موسڵدا[12]، ئەوەتا گەورە خاوەن کارو دارایی ئەڵمانیا (باول ڕوهەر باك) جەخت لە گرنگی ئەم ناوچەیە دەکاتەوە لەگەڵ بەرژەوەندییە نەوتییەکانی ئەڵمانیادا و دەڵێت: "ئایندەی ئەڵمانیا لە ڕۆژهەڵاتدایە لە ئاسیای بچووك و سوریا و میزۆپۆتامیا و فەلەستین، چونکە گرنگترین و دەوڵەمەندترین مەیدانی نەوتی لە جیهاندا لە وێدایە (موسڵ) هەر هێڵی ئاسنی بەغدا–بەرلین بەوێدا تێدەپەڕێت"[13]

سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم(١٨٧٦–١٩٠٩) زانیاری تەواوی بەدەستەوە دەبێت بە بوونی بڕێکی زۆر لە نەوت لەشاری موسڵ و کەرکوك بەتایبەتی، ئەم هۆکارە پاڵ بە سوڵتان دەنێت لە سەردەمی والی عەبدولڕەحمان پاشا لە(١٨٧٩) موسڵ بکات بە ویلایەت، کە لە سێ سەنجەق پێکهاتبوو (موسڵ، کەرکوك، سلێمانی)[14] بەمەش کەرکوك لە مەڵبەندی ویلایەتی شارەزوور کرا بەسەنجقێك لە ویلایەتی موسڵ، ئەویش لەبەر هێڵە سەرەکییەکانی سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی. کەرکوك لە دوای ئەم مێژووەوە دەبێتە ئامانجی سەرەکی تەماحەکانی زلهێزەکان، بەردەوام لە ژێر پشکنینی تیمە زانستی و جیۆلۆجییەکاندا بووە، ئەوە بوو لە ساڵی(١٨٨١)دا شاندێکی زانایانی جیۆلۆجی گەیشتنە کوردستان ولە ناوچەی کەرکوك دەستیان کرد بە گەڕان و پشکنین. لە ئەنجامدا ڕاپۆرتێکیان لەو بارییەوە ئامادە کرد دایانە کاربەدەستان و دەسەڵاتدارانی عوسمانی و ئەڵمانی، کە تیایدا گوتراوە: " کەرکوك و ناوچەکانی دەورووبەری گۆڕەپانێکی مەزنی شاراوەی نەوتە، زۆربەی کانە نەوتییەکانی لەسەر ڕووی زەوییەوە نزیکن، زۆر جار بووەتە هۆی سووکە زەمین لەرزە، ئەگەر هاتوو دەست کرا بە هەڵکەندنی نەوت لەم زەوییانەدا، ئەگەری زۆر هەیە بۆ ڕوودانی بوومەلەرزەی بەهێز"[15].

بە هۆی ئەنجامی ڕاپۆرتی ئەم تیمەوە، لە ساڵی (١٨٨٢) سوڵتان عەبدولحەمید چەند کارێکی ئیداری دەکات، لە وانەش دەست بەسەراگرتنی ڕووبەرێکی زۆر لە زەوییە نەوتییەکانی ویلایەتی موسل بۆ سەر موڵکی تایبەتی خۆی، لەوانەش (گەیارە) لە بەرامبەر بڕێك لە پارەی زۆر کەم، بە بیانووی ئەوەی لە دەست بەسەراگیرانی لەلایەن بێگانەوە پارێزگاری دەکات، هەروەها بۆ سوودی دەوڵەت لە دوارۆژدا بەکاریدەهێنێت[16].

بڵاوبوونەوەی وتار و لێکۆڵینەوەی چەند زانا و گەڕیدەی ئەورووپی لە سەدەی هەژدەهەمەوە تاکو کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، بەڵگەی گرنگ بوون بۆ هەبوونی نەوت بەشێوەیەکی سروشتی، کە لە خۆیەوە هاتووەتە سەر زەوی و بەبڕێکی زۆر وەك گۆمی لێهاتووە، بەتایبەتی لە ناوچەکانی ویلایەتی موسڵ. مەبەستی سەرەکی وتار و لێکۆڵینەوانەی ئەو زانایانە ڕاکێشانی سەرنجی وڵاتەکانیان بوو بەلای نەوتی ویلایەتی موسڵ و گرنگی شوێن و دوارۆژی ناوچەکە، بۆیە بەردەوام نوێنەرانی کۆمپانیاکانی نەوتی جیهانی لە ئەستەنبوڵ کۆبونەوە لەپێناو وەرگرتنی ماف و ئیمتیازی دەرهێنانی نەوت لەم ناوچەیەدا و لەلایەن گەورە دبلۆماسی و وڵاتەکانیانەوە لە ئەستەنبوڵ پشتگیری دەکران. تەنانەت سەردانەکەی قەیسەری ئەڵمانیاش بۆ هەمان مەبەست بوو. ئەم جموجۆڵەی زلهێزەکان لەنێودەوڵەتی عوسمانی لەپێناو وەرگرتنی ئیمتیازی نەوتدا، هانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمی دا بۆ دەرکردنی فەرمانێکی شاهانە لە ٥ی ڕەجەبی ساڵی١٣٠٦ك بەرامبەر بە ٦ی نیسانی ساڵی١٨٩٠ز[17] دەربارەی ناوچە نەوتییەکانی ویلایەتی موسڵ، کە ماف ئیمتیاز و دۆزینەوەی نەوت لەم ناوچەیەدا تایبەتە بە خەزێنەی سوڵتان، هەروەها موڵکی تایبەتی خۆیەتی، دەقی فەرمانەکە بەم شێوەیە هاتووە ودەڵێت: "هەرچەندە هەندێك سەرچاوەی نەوت دۆزراونەتەوە لە موڵکەکانی شاهانەی خۆم بەتایبەتی لە ویلایەتی موسڵ، بێجگە لەو کێڵگانەی باسکراون و زانراون لە موڵکەکانم، کە ئەمەش ناوچەکانی تریش دەگرێتەوە لەم ویلایەتەش، لەگەڵ مۆڵەتی گەڕان و پشکنین وئیمتیازو وەبەرهێنانی نەوت کە بەناوی خەزێنەی شاهانەوە بەستراوەتەوە"(١٨)

[illegible]

فەرمانی یەكەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە ساڵی ١٨٩٠ بۆ گواستنەوەی زەوییە نەوتییەكانی ویلایەتی مووسڵ بۆ خاوەندارییەتی گەنجینەی تایبەتی سوڵتان

سوڵتان بۆ ئەم فەرمانە پاساوی هێناوەتەوە و دەڵێت: "بۆیە ئەم فەرمانەم دەركرد، تەنها بۆ پاراستن و پارێزگاری نەوت لە دەست بەسەراگیران و داگیركرانی لەلایەن دەوڵەتە زلهێزەكانەوە، هەروەها ئەم كەرەستەیە بە موڵكی عوسمانی بمێنێتەوە بۆ ئەوەی لە دواڕۆژدا سوودی بۆ وڵات هەبێت"[١٩].

ئەم فەرمانەی سوڵتان عەبدولحەمید لە ساڵی ١٨٩٠ گەورەترین بەڵگەیە كە دەسەڵاتدارانی عوسمانی بایەخێكی زۆریان بە نەوتی ویلایەتی موسڵ داوە لە كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەهەمدا، هەروەها یەكەم دەستبەسەراگرتنی ناوچە نەوتییەكانی كوردستانە لەلایەن دەسەڵاتدار وحاكمی ئەو سەردەمەوە[٢٠] هەرچەندە لەو سەردەمەدا دەوڵەتی عوسمانی هیچ دەزگایەكی نەوتی یاخود كۆمپانیایەكی بۆ دەرهێنانی نەوت نەبووە تا لەم بوارەدا وەبەرهێنان بكات، بەڵام بوونی نەوت بە بڕێكی زۆر لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە گرنگیی هەبوو[٢١].

ئامانجی سوڵتان لە دەركردنی ئەم فەرمانە بلۆككردنی كاری نەوت لەم ناوچەیە و دانانی سنوورێك بوو بۆ دەوڵەتە زلهێزەكان تا دەوڵەتی عوسمانی خۆی توانا پەیدا بكات و لە دواییشدا خۆی ئەم كارە بكات. هەروەها بۆ ڕای گشتی ڕایگەیاند هیچ وڵاتێك بۆی نییە، بەشوێن سەرچاوەی نەوتدا بگەڕێت لەم ناوچەیەدا، لە بەرامبەر ئەم كارەی سوڵتان بڕێكی پارە دەدات بە خەزێنەی دەوڵەت وەك خەمڵاندنی نرخەكەی، بەم پێیەش ڕێگا لە كۆمپانیا تایبەتەكان گیرا بۆ وەرگرتنی ئیمتیازاتی نەوت لەم ویلایەتەدا[٢٢].

لە ٢ی حوزەیرانی ساڵی١٨٩٠ ئاهەنگێكی گەورە لە ئەستەنبوڵ ئەنجام درا بەبۆنەی بەستنەوەی ڕێگەی ئاسنی(ئەستەنبوڵ-ئەزمیت-ئەنقەرە)، كە (جۆرج فون سیمنس-G.Von.Siemens) بەڕێوەبەری (بانكی ئەڵمانی-Deutsche Bank) بەشداربوو و لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە بەڕێوەبەری ئەشغالی گشتی (ڕەئوف پاشا) بەشداربوو و لە وتارێكیدا بەم بۆنەیەوە داخوازی خۆی و دەوڵەتی عوسمانی دەربڕی بەوەی ئەم هێڵە تا بەغدا بڕوات، هەروەها ئەم ئاهەنگە بۆنی نەوتی لێدەهات، چونكە ئامانجی سەرەكی بانكی ئەڵمانی چاو بڕینە نەوتی ویلایەتی موسڵ و بەغدا بوو[٢٣].

بە پێی ڕاپۆرتی لیژنەی بازرگانی فیدراڵی ئەمریكی، كە لە ساڵی ١٩٥٢ بڵاوكراوەتەوە، ئاماژە دەكات كە گرنگیدان بە وەرگرتنی ئیمتیازاتی نەوت لە ڕۆژهەڵات لە بەرزبوونەوەدا

بووە لەم کاتەدا، هەروەها بەربەرەکانی و ململانێی لەنێوان کۆمپانیاکان چڕتر بۆتەوە لە وەرگرتنی ئیمتیازی نەوت و هێڵی ئاسنی، لە ئاماژەیەکی ئەم راپۆرتەدا هاتووە دەڵێت: " لە ساڵی١٨٩٠ ئەڵمانییەکان لە ڕێگای بانکی ئەڵمانی(Deutsche Bank) ئیمتیازی درێژەپێدانی هێڵی ئاسنی بەغدایان وەرگرت[٢٤]، بەڵام لە راستیدا لە ساڵی ١٨٨٨ کۆمپانیای ڕێگەپێدراو لەلایەن بانکی ئەڵمانی کۆمەڵێك بۆند و گرێبەستی ئیمتیازی هێڵی ئاسنی دەستکەوت لە حەیدەر-ئەنقەرە، هەروەها لە ئەستەنبوڵ-ئەزمیر. لە دواییدا ئەم دەزگایە لە ئاداری ١٨٨٩ وەك کۆمپانیایەکی کارا لە ژێر ناوی(کۆمپانیای هێڵی ئاسنی ئەنادۆڵ) ڕێکخرایەوە و یەکسەر گفتوگۆی دوورودرێژ دەستپێکرد لەگەڵ حکومەتی عوسمانی، لە ساڵی ١٨٩٣ گفتوگۆکان چوونە قۆناغێکی چالاك تر و لە ١٨ی ئاداری ساڵی ١٩٠٢ گەیشتنە کۆتایی بە وەرگرتنی مافی ئیمتیازی هێڵی ئاسنی (بەرلین-بەغدا)، واتە درێژەدانی هێڵەکە لە کۆنیەوە بۆ بەغدا تاکو کەنداوی فارسی بە درێژایی ١٠٠٠میل، بۆ ئەم مەبەستەش لقێکی تایبەت لە کۆمپانیا لە ساڵی ١٩٠٣ لە ژێر ناوی(کۆمپانیای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ هێڵی ئاسنی بەغدا) دامەزرا[٢٥]، ئەڵمانەکان سووربوون لەسەر فراوانکردنی مافی ئیمتیازی هێڵی ئاسنی بەغدا، بەڵام گواستنەوەی موڵکایەتی ئەم زەوییانە بۆ خەزێنەی تایبەتی سوڵتان هەوڵەکانیانی سستکردەوە، چونکە لەو کاتەی ئەوان مافیان پێدرا، فەرمانەکەی سوڵتان دەرچوو، بۆیە تەنها کارەکانی ئەڵمانەکان بەوە نەوەستا کە لە توانایاندا نیە، مافی ئەوەیان نییە بەدوای کانزادا بگەڕێن لەم ناوچەیەدا، بۆیە بەباشیان زانی هیچ فشارێك نەخەنە سەر سوڵتان لەم کاتەدا بۆ وەرگرتنی ئیمتیازاتی تر لە ناوچە تایبەتەکاندا، لە پاڵ ئەوەشدا کۆمپانیاکانی ئەڵمانیا نووسراوێکیان وەرگرتبوو لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە کە لە بواری مافی گەڕانیان بەدوای کانزاکاندا هەبێت "[٢٦].

لە ڕاستیدا سەدری ئەعزەم لە ساڵی١٨٩٠ تەنها بەڵێنی بە بانکی ئەڵمانی دا بوو، کە ڕەزامەندیی دەربڕیوە بەرامبەر ئەوەی مافی گەڕان بەدوای کانزایان پێبدات[٢٧]، بەڵام سەرمایەدارانی ئەڵمان ئەمەیان بە بەڵگەی ماف پێدان هەژمارکرد و ماف دان بە کۆمپانیای هێڵی ئاسنی ئەنادۆڵ، کە مافی کانزاکاری لە ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانی[٢٨].

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم ویلایەتی موسڵ و بەتایبەتیش کەرکوك جێی بایەخ و گرنگیدان بووە لەلایەن دەسەڵاتداران و کەسایەتی تایبەت و جیۆلۆجییەکان و ڕۆژنامەوانان و ئەفسەرانی سوپای زلهێزەکان[٢٩]، کە چەندین ڕاپۆرت و زانیاری تەواویان داوە بەدەستەوە، هەروەها کاتێك بەرزیان کردووتەوە بۆ سەرووی خۆیان و ئاماژەیان کردووە بە بوونی نەوت بە ڕێژەیەکی بەرچاو و زۆر لەم ناوچانەدا، هەروەها نەخشەی تایبەتیان ئامادەکردووە بۆ مەیدانەکانی نەوت لە کوردستان و میزۆپۆتامیا، هەروەها ئاماژەیان بەوە کردووە کە بڕێکی زۆر لە نەوت هەیە تەنانەت دەڵێن: "ئەم ناوچەیە لەسەر دەریایەکی نەوتە"[٣٠].

ئەو ڕاپۆرتانەی گوڵبەنکیان لەنێوان ساڵانی(١٨٩١-١٨٩٤) دەربارەی گرنگی گەنجینەی نەوتی میزۆپۆتامیا پێشکەش بە دەوڵەتی عوسمانی کردبوون سەرنجی سوڵتان عەبدولحەمیدی ڕاکێشا[٣١].

جگە لەوەی چەندین نێردەی جیۆلۆجی و لێکۆڵەری نوێ هاتنە ناوچەکە لە ناویاندا زانای فەرەنسی (جان دی مورگان- J. De. Morgan) لە ساڵی(١٨٩٢)، کە بەڕوونی باس لە دەوڵەمەندی کێڵگە نەوتییەکانی باباگوڕگوڕ دەکات[٣٢]، هەروەها توانیویەتی تێکڕای حەوزی نێوان کەرکوك-خانەقین-و شاخی کوێخا لە قەسری شیرین بە ٣٠٠ کیلۆمەتر لە قەڵەم بدات[٣٣].

(وستال A.F.Stahl) لە ساڵی١٨٩٣، کە ئەندازیارێکی ئەڵمانییە، دەربارەی نەوتی میزۆپۆتامیا ڕاپۆرتێك بڵاودەکاتەوە ئاماژەی بەوە کردووە، کە کێڵگە نەوتییەکانی کوردستان بەگشتی و ناوچەی کەرکوك بەتایبەتی کێڵگەی سەرسوڕهێنەرن، ناش خەملێندرێن، هەروەها کاریگەری و هاندان و چاوتێبڕینی لێ دەکەوێتەوە[٣٤].

لە ساڵی ١٨٩٥ هەندێك ئەندازیاری فەرەنسی بە ڕەزامەندی سوڵتان عەبدولحەمید کاریان کرد بۆ بەرزکردنەوەی بەرهەمەکانی نەوتی خاو لە ناوچەکانی خورماتوو و باباگوڕگوڕ، بەڵام ئەم تیمە سەرکەوتوو نەبوون لە کارەکانیان، بەهۆی پێشهاتە سیاسییەکانی ئەو سەردەمە و چالاکی ململانێی نێودەوڵەتی، کە لەنێوان کۆمپانیاکانی جیهان و دەوڵەتی عوسمانی لەپێناو وەرگرتنی ئیمتیازاتی نەوت و پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا دەستی پێکردبوو. ئەم ململانێیە بەتایبەتی لەنێوان بەریتانیا و ئەڵمان بوو بە شێوەیەکی تایبەت و لەنێوان دەوڵەتە ئەوروپییەکان بوو بە شێوەیەکی گشتی[٣٥].

کاپتن ماونسیل(F .R .Maunsell)*** لە ئایاری ساڵی ١٨٩٧ ڕاپۆرتێك بڵاودەکاتەوە بەناوی کێڵگە نەوتییەکانی میزۆپۆتامیا لە گۆڤاری جوگرافی تیایدا بە ڕوونی ڕیشەو بنەچەی نەوت لەم ناوچانە لەسەر نەخشە دیاریدەکات، ئەوەی دەردەکەوێت بوونی نەوت لەم نەخشەیەدا، کە لە شێوەی پشتێنێك وایە لە زاخۆ شۆڕدەبێتەوە بەرووی ناوچەکانی کەرکوك (باباگوڕگوڕ) و دوای ئەوە درێژدەبێتەوە بەرەو خورماتوو تا دەگاتە ناوچەی کفری، لەم نەخشەیەدا بەڕوونی مەیدانەکانی نەوت لە شێوەی پشتێنێك وایە، کە لە باکووری ڕۆژهەڵات شۆڕدەبێتەوە بەرەو دۆڵی دیجلە تا دەگاتە باشووری ڕۆژهەڵات[٣٦]، ئەم پشتێنیە چەندین ناوچەی پترۆڵی لە خۆ دەگرێت لە وانە (زاخۆ- حەمام عەلی- باباگوڕگوڕ- خورماتوو- نەوت داغ- قەسری شیرین)[٣٧]، هەروەها ماونسیل لە ڕاپۆرتەکەیدا سوودی لە جان دی مۆرگان وەرگرتووە لە گەشتە زانستیەکەیدا سەبارەت بە وڵاتی فارس[٣٨].

ماونسیل لە ڕاپۆرتەکەیدا ئاماژە بە گرنگی نەوتی باشووری کوردستان بەگشتی و کەرکوك بەتایبەتی دەکات و دەڵێت:"گرنگترین هێڵی نەوت لە کێڵگەکانی نەوتی میزۆپۆتامیا ئەو هێڵەیە، کە لە موسڵ درێژدەبێتەوە بەرەو

کەرکوك تا دەگاتە مەندەلی، کە درێژییەکەی ٢٢٠ میلە و پانیەکەی ٦٠ میلە"[٣٩] ئەم پشتێنە نەوتییە بە درێژترین هێڵی نەوت لە جیهان دادەنرێت. هەروەها ولیم دارسی لە ساڵی١٨٩٩ لێکۆڵینەوەی لەسەر کردووە[٤٠].

هەروەها هێڵی تر هەبوون پسپۆران ئاماژەیان پێدابوو، کە لە باشووری کوردستان دەستپێدەکات لە شارۆچکەی گەیارە لە موسڵ، ئەم ناوچەیەش لەلایەن جیۆلۆجی ئەڵمانی رایخ(Reich) دۆزرایەوە لە ساڵی ١٨٣٦، هەروەها لێکۆڵینەوەی لەسەر کرد[٤١]، ئەم پشتێنەیە رووباری دیجلە دەبڕێت و بە ناوچەی کفریدا دەڕوات و لە چیاکانی حەمرین کۆتایی دێت.

هێڵێکی تر لە ناوچەی (حضر) لە باشووری رۆژئاوای شاری موسڵ دەستپێدەکات و لە باکووری شاری مەندەلی کۆتایی دێت[٤٢]، ئەم هێڵەش لە ساڵی١٨٧٤ لەلایەن پسپۆڕێکی بواری نەوت لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە بە ناوی(ماینز)[٤٣].

لە ئەنجامی بوونی نەوت لەو هێڵانەدا کە باسمان کرد، بە پێی زانیارییەکانی ناو نەخشەکەی ماونسیلدا، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە بوونی مەیدانەکانی نەوت لە میزۆپۆتامیا هەمووی دەکەوێتە بەشی رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە، لەوەش ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە، کە زۆربەی مەیدانەکانی نەوت لە میزۆپۆتامیا بە پێی راپۆرتی جیۆلۆجییەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، هەمووی دەکەوێتە ناوچەی باشووری کوردستان، بە پێی ئەم زانیارییانە گرنگترین مەیدانەکانی ناوچەی کوردستانی باشووریش کێڵگە نەوتییەکانی باباگورگورە لە کەرکوك، ئەگەر لە سنووری باشووری کوردستانیش تێپەڕین تەنها ناوچەی (حضر) نەبێت لە موسڵ لەگەڵ هەندێك ناوچە لە تکریت بوونی نەوتی پێوە دیارە، هیچ ناوچەیەکی تر دیاری نەکراوە بە پێی نەخشەکەی ماونسیل[٤٤].

هەرچەندە دەسەڵاتی ئەڵمانیا لە ناو دەوڵەتی عوسمانی زیادی کردبوو، بەڵام سەرمایەدارانی ئەڵمانیا زۆر لە دەست تێوەردان و چاوتێبڕینی دەوڵەتانی ئەورووپا دەترسان، بۆیە قەیسەری ئەڵمانیا لە تشرینی دووەمی ١٨٩٨سەردانی ئەستەنبوڵ دەکات، ئەم سەردانەی سەرکەوتنێکی دبلۆماسیەتی ئەڵمانیا بوو لە دوای سەردانەکەی ساڵی ١٨٨٩ لەناو ئەو ململانێ توندەی لەسەر ئیمتیازی هێڵی ئاسنی دەکرا[٤٥]، هەروەها دوای گەرانەوەی قەیسەری ئەڵمانیا بۆ بەرلین، یەکسەر ناوەندی سیاسیی ئەڵمانیا پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەرلین- بەغدا یان بڵاوکردەوە، کە کاریگەری گەورەی هەبوو لە سەر رەوشی سیاسی ئەو کاتەی ئەورووپا و تەنانەت ئیمپراتۆریەتی بەریتانیای وروژاند، چونکە هەمووان دەیانزانی هێڵی ئاسن بە نەوتی ویلایەتی موسڵ تەڕ کرابوو[٤٦]، هەر هەمان ساڵ ١٨٩٨ کۆنسلی ئەڵمانیا لە بەغدا(فردریك روزن Friedrich Rosen) لە رۆژی ٣١ی ئادار بە ناوچەی هیتدا تێدەپەڕێت و لە یاداشتەکانی خۆی گرنگی ئەم ناوچەیە تۆماردەکات لە بوونی بڕێکی زۆر لە نەوت و قیر، هەروەها ئاماژە دەکات، کە ئەم ناوچەیە لە دێرزەمانەوە بایەخ دارە بە قیر، لە تەوراتیش(العهد القديم) لە بەشی (سفر تكوين) باسی لێوە کراوە[٤٧].

دوا بەدوای ئەم رووداوانە جارێکی تر نەوتی ویلایەتی موسڵ گرنگی خۆی نیشاندەداتەوە و دەبێتە جێگای چاوتێبڕینی داگیرکەران، هەروەها ساڵی(١٨٩٩)ش ساڵێکی گرنگ دەبێت لە مێژووی ئیمتیازاتی نەوتی ئەم ویلایەتە، چونکە ململانێی لەسەر ئەم ناوچەیە قووڵتر دەبێت، هەروەها ئەمجارەش تەماحی عوسمانییەکان و زلهێزەکان دووبارە دەبێتەوە.

ئەوەتا سەرمایەدارەکانی ئەڵمانیا لە ئەستەنبوڵ رەزامەندیی خۆیان نیشان دەدەن بە پێدانی پارە بۆ پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا، رێژەیەکی زۆر لە پشکەکانی ئەم پرۆژەیەش بۆ خۆیان مسۆگەر دەکەن، کۆنترۆڵی بەڕێوەبردنی ئەم کۆمپانیایە دەکەن[٤٨].

تەنها باس لە ناوەندی دارایی دەوڵەتە زلهێزەکان لە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر نەوتی ویلایەتی موسڵ بوو، چونکە ئەم ویلایەتە بەڵگەی زۆر بوو بۆ بوونی نەوت لەم ناوچەیەدا، ئەوەتا لەم ساڵەدا توێژەری ئەڵمانی (بارون ماکس فون ئۆپێنهایم Max Von Oppenheim ١٨٦٠-١٩٤٦) توێژینەوەیەکی چڕو پڕ دەنووسێت لە سەر نەوتی ویلایەتی موسڵی عوسمانی[٤٩].

لە ٩ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٩٩ مەتران ئەدی شیر*** کۆمەڵێك زانیاری گرنگ لەسەر ناوچەی باباگورگور بڵاودەکاتەوە، کە جێگیری ئەسقەف بووە لە ئەبرەشی کەرکوك و ناسراوە بە "ادی ابراهينا صليبا"، ناوبراو دەربارەی گرنگی ناوچە نەوتییەکانی باباگورگور دەڵێت:" لە باکووری رۆژئاوای کەرکوکدا، لە دووری نیو کاژێر بیرێك هەیە نەوتی لێدەردەچێت، لە تەنیشتی شوێنێك بەناوبانگ هەیە پێی دەڵێن باباگورگور، چەند جارێك بیستوومە کە ئاگرێکی بەرزی هەیە و سەر لە بەیانیی رۆژی ٩ تشرینی یەکەمی سەردانی ئەم ناوچەیەم کرد.. بۆ ماوەی کاژێرێك و نیو گەیشتینە بیرە نەوتێك، کە ئاگرێك نزیکی هەیە و نەوتێکی زۆر تێکەڵ بە ئاو بووە، لەم ناوچەیەدا سەرچاوەی نەوت زۆرن... لە ساڵی ١٨٩٧ دانیشتووانەکەی نەوتیان دەردەهێنا و دەیانخستە ناو کوندە و بەکاریان دەهێنا بۆ پێداویستی رووناککردنەوە... هەروەها خۆڵی ئەم ناوچەیە زۆر مزرە بەدەمی خۆم تامم کردوە و دانیشتووان دەیان فرۆشت بە منداڵان و هەندێك جار بەکاری دەهێنن لە جیاتی ترش (سماق) چونکە زۆر مزر بوو...، کرێکارێك لە بواری ئەم نەوتە پێیراگەیاندم کە خەڵکانیکی زۆر سەردانی ئەم مەزارەیان کردووە بۆ چاکبوونەوەی هەندێك نەخۆشی، ...، هەروەها دەڵێت زۆرینەی دانیشتووانی ئەم ناوچەیە بە پیرۆزی دادەنێن، رۆژانی چوارشەمە سەردانیان دەکرد و قوربانیان بۆ دەهێنا..."[٥٠].

ئەو زانیاری و رووداوانەی سەرەوە ئەنجامی گرنگیان لێکەوتەوە، گرنگترینیان دەرکردنی فەرمانی شاهانەی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بوو لە ساڵی ١٨٩٩دا کە ئەمجارەیان ویلایەتی بەغداشی گرتەوە لەگەڵ ویلایەتی



فەرمانی دووەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە ساڵی ١٨٩٩ بۆگواستنەوەی زەوییە نەوتییەکانی ویلایەتی موسڵ و بەغدا بۆ خاوەندارییەتی گەنجینەی تایبەتی سوڵتان.

موسڵی عوسمانی، ئەم فەرمانە خاوەندارییەتی گشتی زەوییە دەوڵەمەندەکان بە نەوت و قیر لە ناوچەکانی مەندەلی و خورماتوو و باباگورگوڕی گوڕی بۆ خاوەندارییەتی تایبەتی سوڵتان، هەموو کارەکانی وەستاند بۆ گەشەکردن و پێشخستنی سەرچاوەکانی نەوت و چاکردنی لەم ناوچانەدا.

ئەم فەرمانە هەمان کاریگەرییەکەی فەرمانی ساڵی ١٨٩٠ لەسەر ململانێی زلهێزەکان بۆ کۆنترۆڵکردن و ئیمتیاز وەرگرتنی ئەم ناوچانە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی هەبوو، ئەوەتا لە ٢٤ی تشرینی دووەمی ١٨٩٩ سوڵتان عەبدولحەمید ڕێککەوتنێکی بنچینەیی لەگەڵ کۆمپانیای هێڵی ئاسنی ئەنادۆڵ بەست بۆ بەستنەوەی کونیە بە بەسرا و کەنداو[٥١].

ئەم ڕێککەوتنەی نێوان سوڵتان و کۆمپانیای ئەڵمانی بووە جێی دڵەڕاوکێی دەوڵەتە زلهێزەکان و لە بەرامبەردا هەوڵەکانیان چڕترکردەوە بۆ وەرگرتنی ئیمتیاز بۆ خۆیان لای دەوڵەتی عوسمانی. ئەوەتا هەندێك لە کۆمپانیاکانی بەریتانی و هۆڵەندی سەرقاڵ بوون بە هەوڵدان بۆ وەرگرتنی ئیمتیازی نەوتی میزۆپۆتامیا لە سوڵتان عەبدولحەمید لە ماف پێدان بە بەشداریکردنی لە پرۆژەی هێڵی ئاسنی، بەڵام هەوڵەکانی بەریتانیا و هۆڵەندا سەرکەوتوو نەبوو، چونکە دەسەڵاتی ئەڵمانیا لە دەوڵەتی عوسمانی بەهێزتر بوو[٥٢].

لە ساڵی ١٩٠٠دا حکومەتی ئەمریکا (کۆلبی میتچێل چستەر-Colby Mitchel Chester) ئەدمیراڵی خانەنشینی خۆی، کە سەرکردایەتی کەشتیی (دەریایی کنتاکی-Kentucky) دەکرد، ناردە ئەستەنبوڵ بۆ فشارخستنە سەر سوڵتان عەبدولحەمید بۆ قەرەبووکردنەوەی موڵك و ماڵی هاووڵاتیانی ئەمریکی، کە لە کاتی کۆمەڵکوژییەکەی ئەرمەنەکان ساڵی ١٨٩٦ وێران کرابوون، ئەو بڕە پارەیەی چستەر داوای دەکرد، تەنها ٩٥ هەزار دۆلار بوو، ئەویش بڕێکی کەم بوو[٥٣]، بەڵام لەڕاستیدا ناوبراو تەنها دەیویست فشار بخاتە سەر دەوڵەتی عوسمانی و هەروەها خوازیاری پشك بەدەستهێنانی ئەمریکا بوو لە پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەرلین- بەغدا لەگەڵ ماف گەڕان بەدوای کانزاو نەوت بە درێژای ٢٠کم لە هەردوو لایەنی هێڵەکەدا[٥٤].

سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە ساڵی ١٩٠١ دا ڕێگا بۆ تیمێکی زانستی و پسپۆڕان و ڕۆژنامەوانی ئەڵمانی خۆش دەکات بۆ ئەوەی توێژینەوەی ورد بکەن لەسەر مەیدانەکانی نەوتی میزۆپۆتامیا، ئەم شاندە ڕاپۆرتێکی فراوانیان بۆ حکومەتی ئەڵمانیا بەرزکردەوە، کە هانی حکومەتی دا بۆ کۆنترۆڵ کردنێکی ڕاستەوخۆی ناوچەکانی میزۆپۆتامیا بۆ ئەوەی دەست بەسەر ناوچە نەوتییەکاندا بگرن، چونکە ئەم شاندە لە ڕاپۆرتەکەیاندا وا باسی ناوچەکانی میزۆپۆتامیا

دەکەن، کە دەریاچەیەکی ڕاستەقینەیە لە نەوت و بڕێکی زۆر لە نەوت و پتێومین و گازی سروشتی هەیە و زۆر دەوڵەمەندە لەچاو ناوچەکانی باکۆدا[٥٥].

بەهۆی کاریگەری ئەم ڕاپۆرتەی حکومەتی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٠١ بە (پاول ڕۆهەرباخ–Paul Rohrbach ) توێژینەوەی باری میزۆپۆتامیای بەگشتی کرد لەبواری جوگراف و ئابووریدا و سەردانی شاری کەرکوکی کرد بە تایبەتی کە لە ناوەڕۆکیدا هاتبوو:" گرنگترین ناوچەی میزۆپۆتامیا، کە گەورەترین شوێنی پترۆڵ و قاری تێدایە، کێڵگە نەوتییەکانی کەرکوکن..."، هەروەها لە درێژەی ڕاپۆرتەکەی ئاماژە دەکات بەوەی کە "...لە قووڵایی (٤–٥ ) مەتر نەوت دۆزراوەتەوە، کە ڕاستەوخۆ نەوتێکی خاوێن بەبڕێکی زۆر هەڵدەقوڵێت، هەرچەند بە شێوەیەکی سەرەتایی بەرهەم دەهێنرێت، بەڵام بڕێکی بەشی دانیشتووانی شاری کەرکوك دەکات، کە نزیکەی ١٥هەزار کەس دەبن...". هەروەها ئاماژەدەکات: " بەو وێنە سەرسوڕهێنەرەی لە باباگورگور هەیە لە بەرز بوونەوەی ئاگرێکی ئەستوونی لەنەوت و گازی هایدرۆکاربۆنی... ئاماژە بەوە دەکات کە مەترسی هەیە لەوەی ئەڵمانیا ئەم جارەش دواکەوێت لە ئامادەبوونی لەم ناوچەیەدا "[٥٦].

پسپۆران و جیۆلۆجییەکان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمەوە باوەڕیان وابوو کە مەیدانەکانی نەوت لە ژێر زەویدا لە شێوەی دەریاچەدایە، هەروەها ئاماژەیان بەوە کردووە کە مەیدانەکانی نەوتی میزۆپۆتامیا و نەوتی وڵاتی فارس یەك مەیدانە و بەیەك دەگەن لەگەڵ مەیدانەکانی باکۆ لە ڕووسیا. جان دی مۆرگان لە گەشتەکەیدا بۆ ناوچەی قەسری شیرین و شووش لە نزیکەوە ئەم کێڵگانەی بینیوە و لێکۆڵینەوەی وردی لەبارەی پێکهاتەی جیۆلۆجی ئەم چاڵە نەوتیانە کردووە و گەیشتووتە ئەو باوەڕەی کە ئەمانە بەشێکن لە پشتێنەیەکی نەوت لە ناوچەکەدا لە لورستانەوە (پشتکوە)دەستپێدەکات و کێڵگەکانی باباگورگور لە خۆ دەگرێت بەرەو ناوچەی شووش و قەسری شیرین دەڕوات تا دەگاتە ناوچەی ئەهواز و بەندەر عەباس[٥٧].

بۆچوونی ئەم پسپۆرانە کاریگەریی هەبوو لەسەر تەماحەکانی ولیەم دارسی بۆ فراوانبوونی ئەو ئیمتیازەی کە لە ناوچەکانی کوردستانی ئێران دەستی کەوتبوو تا مەیدانەکانی نەوتی میزۆپۆتامیاش بگرێتەوە، بۆیە لە ساڵی ١٩٠١ دارسی نوێنەری خۆی(مارێوتMarriot) ڕەوانەی ئەستەنبوڵ کرد بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ بەرپرسانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ وەرگرتنی ئیمتیازی نەوتی هەردوو ویلایەتی موسڵ وبەغدا. لە ساڵی ١٩٠٣ ئەم داواکاریەی دارسی دووبارە دەبێتەوە بە ناردنی نوێنەرێکی تر بەناوی نیکۆلاس–H. E. Nichols)*، ئامانجەکانی دارسی لەم گفتوگۆیانە بەهۆی دەسەڵاتی ئەڵمانیاوە لەسەر دەوڵەتی عوسمانی سەری نەگرت[٥٨]، ئەوەی کە دارسی لە هەنگاوەکانیدا دەستی دەکەوێت تەنیا نووسراوێك بوو لەلایەن سەدری ئەعزەمی عوسمانی[٥٩]، کە بەڵێنی پێی دابوو سوڵتان هەوڵەکانی خۆی ڕێك دەخات لە داوارۆژدا بۆ بەخشینی ئیمتیازی نەوتی ویلایەتی موسڵ بەو[٦٠]، بەڵام دارسی بێ هیوا نەبوو لە وەرگرتنی ئیمتیازی نەوتی ویلایەتی موسڵ، بۆیە لە ساڵی ١٩٠٤ هەنگاوێکی تری نا، ئەگەرچی ئەمجارەشیان سەرکەوتوو نەبوو[٦١]، بەڵام هەوڵەکانی دارسی کاریگەرییان هەبوو لەسەر پەکخستنی چالاکییەکانی ئەڵمانیا لەم ململانێیەدا، چونکە ماوەی هەڵبژێردراو بۆ کارکردنی کۆمپانیای هێڵی ئاسنی ئەنادۆڵ تەواو بوو، حکومەتی عوسمانی ئەو ڕێککەوتنەی لەگەڵ کۆمپانیا مۆری کردبوو لە ١٧ی تەموزی ساڵی ١٩٠٤ بە هەڵوەشاوەی دادەنا[٦٢]. گفتوگۆکانی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر نەوتی ویلایەتی موسڵ بە ئاراستەی دارسی ڕۆیشت و لە ساڵی ١٩٠٦ دووبارە بووەوە[٦٣].

لە ڕاستیدا دارسی لەم کاتەدا، لەلایەن دەسەڵاتدارانی بەریتانیاوە لە ئەستەنبوڵ پشتگیری لێدەکرا. ئەوەی شایەنی باس بێت بەریتانیا لەم کاتەدا بەدوای هەندێك ئامانجی دیاریکراودا دەگەڕا، لە گرنگترینیان دوورخستنەوەی ئەڵمانیا بوو لە ناوەندی ڕۆژهەڵات، تادەست بەسەر نەوتی میزۆپۆتامیادا بگرێت بۆ ئەوەی بەربەستێك بۆ ئەڵمانیا دابنێت و سوود لە نەوتی میزۆپۆتامیا وەرنەگرێت[٦٤]، لەلایەکی ترەوە داڕێژەری سیاسەتی بەریتانیا هۆی ئەم پشتگیرییە دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو گرنگییە دیپلۆماتی و ستراتیژییەی ئیمتیازی نەوتی ویلایەتی موسڵ هەیەتی، لەبەر ئەوەی ناوچەکانی ئیمتیازی دارسی هاو سنوورن لەگەڵ ناوچە نەوتییەکانی میزۆپۆتامیا، بۆیە گرنگە بۆیان ڕێگا نەدەن بەهەر بەرژەوەندییەکی بیانی کۆنترۆڵی نەوتی ئەم ناوچەیە بکات، لە ستراتیژیی بەرژەوەندیی بەریتانیا نەبوو ئەم ناوچەیە کۆنترۆڵ بکرێت لەلایەن هێزێکی بیانییەوە[٦٥].

ئەگەر بڕوانینە ئەو سنوورەی کە پرۆژەی هێڵی ئاسنینی بەغدای پێدا دەڕوات، ئەوا هۆکاری سەرەکی ململانێی زلهێزەکان و بەتایبەتی ئەڵمانیا لەسەر وەرگرتنی ئیمتیازی کارکردنی ئەم پرۆژەیەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، چونکە بە ناوچەیەکی ستراتیژی و ئابووری گرنگدا دەڕۆیشت، بە تایبەتی کوردستان سامانێکی سروشتی زۆری تێدایە کە نەوتە. هەروەها ئەڵمانەکان زانیاری پێشوەخت و ئامادەیان هەبوو لەسەر گرنگی ئەم ناوچەیە، بۆیە پێیان لەسەر بە دەستهێنانی ئیمتیازی هێڵی ئاسنی بەغدا دادەگرت. بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم بۆچوونەش، جێی خۆیەتی ئەو خاڵە گرنگانەی لە ڕاپۆرتەکەی دکتۆر پاول ڕۆهەرباغ دەربارەی گرنگی ناوچەکانی کەرکوك لە ڕووی سامانی نەوتەوە هاتووە بخرێنە ڕوو، کە دەڵێت: " ئەگەر پرۆسەی هەڵکەندن هەبێت لە کەرکوك بێ گومان گەنجینەیەکی گەورە لە نەوت دەستدەکەوێت، بۆیە بەلایەنی کەمەوە دەتوانرێت سوود لە داهاتی ئەم ناوچانەی دەکەونە تەنیشت پرۆژەی هێڵی ئاسنینی بەغدا وەربگیرێت بۆ گەیشتن بە دەوڵەتەکانی کەنداوی فارسی و هەندێك شوێنی دوور وەك هیندو ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، لە ڕێگای کەشتی بارهەڵگری نەوتەوە کە

دەتوانین بەگەڕیان بخەین بە هۆی گەشەسەندنی بەرهەمی نەوتی کەرکوك و بەسرە، لە ڕێگای شەتولعەرەبەوە، چونکە ئاسانتر و خێراترە لە ڕێگای کەنارەکانی ئەتلەنتی ئەمریکا، یاخود ئەگەر بە باکۆدا بڕۆین...، بەڵام دەبێت ئامێر و کەرەستەی هێڵی ئاسنینی بەغداو هێڵە لاوەکییەکانی ئایندە، کە بۆ گەیشتن بە کەرکوك دروستدەکرێن ژمارەیەکی پێویست لە فارگۆنی گواستنەوەی نەوتی لەگەڵدابێت بۆ جێبەجێکردنی پێداویستییەکان. هەروەها دەبێت ئەم پرۆکەیە سەرنجی دەزگا پەیوەندیدارەکانی ئەڵمانی پێی ڕاکێشین، تا بزانن چەند گرنگە...، ئەگەر خۆمان بە لێپرسراو بزانین لە ئەنجامدانی ئەم ئەرکە زۆر سوودمەند دەبین بە هۆی ئەو ئاسانکارییانەی هەن لە بەرهەمهێنانی نەوت لە کەرکوك و بەگەڕخستنی هێڵی ئاسنی لە ئەستەنبوڵەوە بۆ کەنداو قازانجێکی زۆری دەبێ"[٦٦]، هەروەها گرنگی ستراتیژی ئەم ناوچەیە هۆکارێکی تر بووە، بەڵام گرنگی ناوچەی نێوان بەغدا-کەنداو تەنها ئامانجی سەرەکی بۆ گواستنەوەی کەرەستەی خاو بووە تا لە ڕێگای کەنداوەوە بۆ دەرەوەی وڵات بنێردرێت، بەتایبەتیش نەوتەکەی، جگە لەم هۆکارانە هۆکاری تری ئابووری و سیاسی و سەربازیشی هەبوو، هەر بۆ یەش کە زلهێزەکان ململانێی توونديان لەسەر ئەم پرۆژەیە دەکرد.

ئەگەر سەیری هەموو قۆناغەکانی ڕاکێشانی پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا-بەرلین بکەین، دەبینین هەموو جارێك، کە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بەڵێن بە کۆمپانیاکانی ئەڵمانی دەدات بۆ وەرگرتنی ئیمتیاز و کارکردنی لەم پرۆژەیەدا، لەگەڵ ئەم بەڵێنانەدا سوڵتان فەرمانی شاهانەی خۆی دەرکردووە بۆ گواستنەوەی موڵکایەتی ناوچە نەوتییەکانی ویلایەتی موسڵ بۆ خەزێنەی تایبەتی خۆی، ئەوەتا سوڵتان لە ٧ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٠٣ فەرمانێکی شاهانە دەردەکات بەهەمان چەشنی فەرمانەکانی تر، بەڵام ئەمجارەیان هۆکاری گواستنەوەی ئەم ناوچانە ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت: "لەبەر ئەوەی کانە نەوتی زەبەللاح لە موڵکەکانی ناو قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆرییەتەکەم لە ویلایەتی موسڵ هەڵدەقوڵێ "[٦٧].

لە ٥ی ئاداری ساڵی ١٩٠٣ سوڵتان بەڵێنی خۆی جێبەجێدەکات و ئیمتیازی کۆتایی بە بانکی ئەڵمانی دەدات بۆ ڕاکێشانی هێڵی ئاسنی بەغدا. لە دانشتنێکدا لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی(زهنی پاشا) وەزیری ئەشغاڵ و بازرگانی ئامادەبووە[٦٨]، لەلایەن ئەڵمانیا، نوێنەرەکانی کۆمپانیای ئاسنی ئەنادۆڵ و بەغدا و بانکی ئەڵمانی ئامادەبوون بۆ مۆرکردنی ئەم ئیمتیازە[٦٩]، هەروەها بڕیار درا هێڵەکە لە کۆنیەوە دەستپێبکات تا کەنداوی فارس، لەگەڵ ماف بەخشینی چەندین ئیمتیاز لەبوارەکانی تردا، بەڵام لە گرنگترین ئەو بڕگانەی لەم ئیمتیازەدا لە پاڵ ڕاکێشانی هێڵەکە بە ناوچەکانی کوردستان و گەیشتنی بە کەنداوی فارس هاتبوون، ئیمتیازی بەکارهێنانی ئەو ناوچە کانزایی و نەوتییانەی تێدابوو کە ئەم خاڵە زیاتر پەیوەندیدارە بە بابەتی توێژینەوەکەمانەوە، یەکێك لە بەندەکانی ئەم ڕێککەوتنە بڕگەی یەکەمی ماددەی ٢٢بوو، ئاماژەی بەوە کردبوو کە:"ماف دەدرێت بە خاوەن ئیمتیاز کە هەموو کانگاکان بەکاربهێنێت لە کاتی دۆزینەوەی بۆ سوودی خۆی لەو ناوچانەی هێڵەکەی پێدا تێدەپەڕێت بە پانتایی ٢٠کم لە هەردوو لای هێڵەکەوە... "[٧٠]، بەمەش ئەو ناوچە نەوتییانەی کەوتبوونە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ڕووباری دیجلەوە، کەوتنە ژێر دەسەڵاتی خاوەنی ئەم ئیمتیازە.

لە١٧ی تەموزی ساڵی١٩٠٤ وەزیری تایبەتی سوڵتان(ئۆهانیس ئەفندی ساکسیانOhannes Effendi Sakisian) و بەڕێوبەری گشتی هێڵی ئاسنی ئەنادۆڵ(کورت تزاندر) ڕێککەوتنێکی بەناوبانگ مۆردەکەن بۆ بەخشینی ماف و ئیمتیازی پەرەپێدانی کێڵگە نەوتییەکانی هەردوو ویلایەتی موسڵ و بەغدا. ئەم ڕێککەوتنە بە(ڕێککەوتنی زاندر) ناسراوە کە بەڵگەیەکی زۆر گرنگ بوو چونکە بانکی ئەڵمانیای ئیمتیازی سەرەتایی بۆ ماوەی٤٠ ساڵ بۆ دەسبەسەراگرتنی کانە نەوتییەکانی میزۆپۆتامیا هەژمارکرد[٧١]، لە بڕگەی یەکەمی ئەم ڕێککەوتنەدا هاتووە:" کۆمپانیای هێڵی ئاسنی ئەنادۆلی لە سەر ئەرك و بووجەی خۆی لە ماوەی ساڵێك لە مێژووی ئاڵوگۆڕکردنی بەڵگەکانی ئەم ڕێککەوتنە، کۆمپانیا کە هەڵدەستێت بە توێژینەوەیەکی سەرەتایی و جیۆلۆجی ناوچە نەوتییەکانی ویلایەتی موسڵ و بەغدا، کە خاوەندارێتی ئەم ناوچانە دەگەڕێتەوە بۆ خەزێنەی تایبەتی سوڵتان بەپێی فەرمانەکانی ساڵانی (١٩٠٣، ١٨٨٩، ١٨٩٠)". هەروەها لە بڕگەی دووەمدا هاتووە:"ئەگەر ئەم کۆمپانیایە کۆتایی بە توێژینەوەکەی هێنا، ئەوا لەسەر ئەرکی خۆی ئەم کێڵگە نەوتییانە بەکاردەهێنێت و بۆ ماوەی٤٠ ساڵ ماف پێدەدرێت بەپێی ڕێککەوتنامەیەکی تایبەت کە بە پێی خواست و ڕەزامەندی حکومەتی عوسمانی بێت، ئینجا ڕێگای بەکارهێنانی دەدرێت، ئەویش دەبێ بە هاوکاری و سەرپەرشتی وەزارەتێکی تایبەتی حکومەتی عوسمانی بێت"[٧٢].

لە ساڵی١٩٠٤ کۆمپانیای ئەڵمانی دەستی کرد بە توێژینەوە لەسەر ئەو زەوییانەی ئیمتیازەکە دەیانگرێتەوە بەتایبەتی لە ویلایەتی موسڵ لەڕێگای ناردنی تیمێکی پسپۆڕانی جیۆلۆجی بە سەرۆکایەتی دکتۆر پورۆ(Dr. Porro)[٧٣]، پاشان دەستی کرد بەنەخشەی ڕاکێشانی هێڵی شەمەندەفەرەکە، بۆئەوەی لە بەکارخستنی ئەو ناوچە کانزایی و نەوتییانە کەڵك لە مافەکانی خۆی وەربگرێت. ئەمیش خۆی لە خۆیدا بایەخێکی نێودەوڵەتی تر بوو لەمەڕ ئەو ئیمتیازە نەوتییەی هێنایە ئاراوە و گفتوگۆ و مشتومڕی زیاتری دەوڵەتی عوسمانی و کۆمپانیا ئەڵمانییەکەی لێکەوتەوە[٧٤].

دەقی گرێبەستی تزاندر کە لە ڕێکەوتی ٤ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٠٤ لەنێوان خەزینەی تایبەتی تورکی و کۆمپانیای عوسمانی بۆ هێڵی ئاسنی ئەنادۆڵ بەسترا، بەپێی ئەم ئیمتیازە، دەبوایە کۆمپانیاکە پشکنینی سەرەتایی دەربارەی نەوتی ویلایەتی موسڵ و بەغدا ئەنجام بدات و ئەنجامەکانی بە هاوپێچی لەگەڵ لیستێك لە خەرجییەکانی پشکنینەکە بۆ خەزێنەی تایبەت بنێرێت، وەك دەسپێکێك بۆ چوونە ناو

گفتۆگۆ دەربارەی ئیمتیازە نوێیەکەی. لە مانگی شوبات تا مانگی نیسانی ساڵی١٩٠٥ تیمێکی زانستی لە ناوچەکانی ویلایەتی موسڵ مانەوە و یەکەم راپۆرتی خۆیان لە کۆتایی مانگی تەموزی ساڵی ١٩٠٥ بە ناوی (چەند توێژینەوەیەك دەربارەی کانە نەوتی و ئەسفەلتییەکانی ناوچەکانی دیجلە و فورات) پێشکەش کرد و لە ٢٦ ئۆگستۆسی ساڵی١٩٠٥ راپۆرتی کۆتاییان پێشکەش کرد و لە ناوەڕۆکی راپۆرتەکەدا هاتبوو: " ... ناتوانین جەخت لەسەر هەبوونی نەوت لە قووڵایی ناوچەی گەیارەدا بکەین، هەروەها ئامۆژگاری نادەین بە پرۆسەی هەڵکەندن، چونکە زۆری تێدەچێت، ... ئەو ناوچانەی تر کە سەردانمان کردوون، وەك باباگوڕگوڕ، دووزخورماتو، پەڵکانە، گیل، کفری و هەموو ناوچەکانی تر نەوتێکی زۆریان لێ نییە هەرچەندە باباگوڕگوڕ لە هەموویان باشترە...، بەڵام ئامۆژگاری نادەین، چونکە دەبێت کاری هەڵکەنین بە قووڵاییەکی زۆر بکرێت بۆ زانینی ئەو پرسیارەی ئایا نەوت بوونی هەیە لەم ناوچەیەدا؟"[٧٥]، لەراستیدا ئەم تیمە هیچ کارێکی هەڵکەندنی بیر دۆزینەوە (استكشافي) بۆ مەبەستی رووماڵکردن ئەنجام نەدا، تەنها هەندێك نموونەی لە خاکی ناوچەکە وەرگرت لەگەڵ کێشانی نەخشە و وێنەی فۆتۆگرافی لە پێکهاتەی تۆبۆگرافی لە زەوی ناوچەکە وەرگرت، ئەم پرۆسەیەش پرۆسەیەکی قورس بوو، چونکە ڕێگاوبان هیچ باش نەبوو بۆ گەیشتن بە ناوچە گرنگەکان، دابینکردنی ئامێری هەڵکەندن و گەڕان زۆر دژوار بوو بەهۆی بوونی چەند رووبارێك و بەربەستی جوگرافییەوە، ئەمە جگە لەوەی ئەندامانی تیمەکە یەك رانەبوون لە بۆچوونەکانیاندا، بۆیە ئەو راپۆرتەیان، کە پێکهاتبوو لە ١٠٠ لاپەڕە، هیچ هاندەر نەبوو[٧٦].

بەڵام لە حوزیرانی ١٩٠٥ ماوەی ئەم پشکنینە کۆتایی پێ دەهات، چونکە ساڵێکی بەسەردا تێدەپەڕی، بەڵام کۆمپانیا هیچ ئەنجامێکی پشکنینی نەنارد بۆ خەزێنە، بۆیە خەزێنە نامەیەکی ئاراستەی کۆمپانیاکە کرد و بە بیری هێنایەوە، کە کۆمپانیا گفتی داوە، بۆیە ئەم نامەیە بوو بە سەرەتای ئاڵوگۆڕی چەندین نامەگۆڕینەوە لەنێوان خەزێنەی تایبەت و کۆمپانیا کە تا مانگی مارتی ١٩٠٧ بەردەوام بوو[٧٧].

لە ئەنجامدا ئەم مشتومڕەی نێوان خەزێنەی تایبەتی عوسمانی و کۆمپانیای ئاسنی ئەنادۆل، کۆمپانیا داواکاری دا بە وەزیری خەزێنەی تایبەت و پێڕاگەیاند کە بە پێی مەرجەکان مافی خۆیەتی تێچوونی توێژینەوە جیۆلۆجیەکان لەسەر ئەم ناوچەیە کردوویانە بۆ ماوەی ساڵێك قەرەبووکردنەوەی کە بە (٢٠) هەزار پاوەن ئەستەرلینی مەزەندە دەکرێ بخاتە ئەستۆی خەزێنەی تایبەتەوە[٧٨]. لە کۆتاییدا وەزیری خەزێنەی تایبەت لە ٢٦ی کانونی دووەمی ١٩٠٧ نامەیەك ئاراستەی کۆمپانیا دەکات و پێڕادەگەیەنێت کە ماوەی ساڵ و نیوێك بەسەر بەڵێنەکانی کۆمپانیادا تێپەڕیوە و دەبوایە راپۆرتی لیژنەی پشکنینی بناردایە، بەڵام جێبەجێی نەکردووە، بۆیە هیچ گفتوگۆیەك لەنێوان هەردوولادا پێویستیی نەماوە. کۆمپانیاش لە ٩ی شوباتی هەمان ساڵدا نامەیەك بۆ وەزیر دەنێرێ کە وەڵامێکی توندی تێدابوو، هەروەها پێڕاگەیاند هەموو مافەکانی کۆمپانیا بەپێی ڕێکەوتن دەبێت بدرێت، بۆیە کۆمپانیا رایگەیاند، کە ئیمتیازەکەیان تەواو نەبووە، چونکە قەرەبوو نەکراونەتەوە[٧٩].

حکومەتی عوسمانی رایدەگەیەنێ کە ئیمتیازی نەوتی کۆمپانیای هێڵی ئاسنی بەغدا لەگەڵ خەزێنەی تایبەتی هەڵوەشاوەتەوە لە ٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٠٧ و لە ٤ی ئاداری ساڵی ١٩٠٧ ئەم بڕیارەی پەسەند کرد، حکومەتی عوسمانی بەرەو گفتوگۆ رۆیشت لەگەڵ گرووپی دارسی لە ساڵانی ١٩٠٦- ١٩٠٧[٨٠].

لە پاڵ ئەڵمانیا و بەریتانیا کۆمپانیای نەوتی (رۆیاڵ دۆچ-شێل .The Royal Dutch-Shell Oil -Co)[٨١] هەوڵی بەدەست هێنانی ئیمتیازی نەوتی ویلایەتی موسڵی دەدا، بە هاوکاری و یارمەتی یەکێك لە لقەکانی کۆمپانیا، لە لەندەن تۆمارکرابوو ئەویش کۆمپانیای (ئەنگلۆ_ساکسۆن (The Anglo-Saxon Oil Co.)) بوو، گولبەنکیان ڕۆڵێکی زۆری هەبوو لە هاندانی ئەم کۆمپانیایە کە بایەخ بە ئیمتیازی نەوتی ویلایەتی موسڵ بدات لە ساڵی ١٩٠٧[٨٢].

دوای سەردانەکەی ئەندازیاری بەلجیکی(پول جرو سکوبس) لە ساڵی ١٩٠٧ بۆ ناوچە نەوتییەکانی ویلایەتی موسڵ، دەستیکرد بە پێوانەکردنی زەوی ئەم ناوچەیەوە، دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت کە نەوتێکی زۆر لەم ناوچانە بوونی هەیە. کۆمپانیای بەلجیکی دروستبوو و داوای لە حکومەتی عوسمانی کرد کە مافی ئیمتیازی نەوتی ئەم ناوچانەی پێ ببەخشێ[٨٣].

پێش ڕوودانی کودەتای ژوونی تورکەکان، لە ساڵی ١٩٠٨ بۆ جاری دووەم ئەمریکییەکان هاتنە ناو مەیدانی ململانێ لەسەر ویلایەتی موسڵ، بەتایبەتی کاتێك لە ساڵی ١٩٠٨ پەرلەمانی عوسمانی باسی دامەزراندنی هێڵێکی کردبوو، لە باکووری کوردستانەوە بێت و پاشان بۆ موسڵ و لەوێوە بەرەو کەرکوك بڕوات. کۆمپانیای وایتی ئەمریکی (J.G.White Company) جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیەی لە ئەستۆی خۆی گرت[٨٤]. لە هەمان کاتدا حکومەتی ئەمریکا نوێنەری خۆی ئەدمیراڵ کولبی مایکل چێستەری(C.M.Chester) نارد بۆ کۆنگرەی نێودەوڵەتی حەوتەم لە جنێف، لە کۆتایی ئەم کۆنگرەیەدا چێستەر یەکسەر بەرەزامەندی وەزارەتی دەرەوە و دەریایی ئەمریکا بەرەو ئەستەنبوڵ ڕۆیشت بۆ توێژینەوە لەسەر تواناکانی وەرگرتنی چانسی وەبەرهێنانی ئەمریکی لەم ناوچەیەدا، ناوبراو بەشێوەی نوێنەری ژووری بازرگانی لە بۆستن و نیویۆرك و دەستەی بازرگانی نیویۆرك هاتبوو[٨٥]، چێستەر بەختەوەر بوو لە پشتیوانی سەرۆکی ئەمریکی (تیۆدور ڕۆزفلت- Theodor Roosevelt) (١٩٠١-١٩٠٩) لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (ئەلیهو ڕووت Eliho -Root)[٨٦]. ئەمە دووەم سەردانی چێستەر بوو بۆ ئەستەنبوڵ، چێستەر زیاتر زانیاری پەیداکردبوو کاتێك (ئاسەر مور-Arther Moore) لە ساڵی ١٩٠٦ سەردانی دەوڵەتی عوسمانی کردبوو و پلانی پرۆژەی ڕاکێشانی هێڵی ئاسنی لە حەلەبەوە بۆ کەنارەکانی دەریای

ناوەڕاست لە ئەسکەندەرونە لەگەڵ خۆی هێنا بوو، ئارسەر مور قەناعەتی بە کولبی چێستەر هێنابوو تا لە پرۆژەکەیدا بەشداری بکات. ئەم دوو کەسایەتییە لەلایەن ئەدمێراڵ چێستەرەوە پشتگیریان لێ کرابوو، باوکی مور هاوبەش بوو لە کۆمپانیای کەرەستەو ئامێرەکانی ڕێگای ئاسنی، ئەمیش یارمەتیی دەدان[٨٧].

چێستەر لەگەڵ سوڵتان عەبدولحەمید پەیوەندییە سەرەتاییەکانی ڕێکخست، هەندێك سەرچاوە ئاماژەدەکەن بەوەی چێستەر ڕێزوحورمەتی زۆری لێگیرا لەلایەن گەورە پیاوان و دەسەڵاتدارانی حکومەتی عوسمانییەوە، سوڵتان دەستخۆشی لێکرد و ڕێگای دا بە هاتنە ناوەوەی سەرمایەی ئەمریکی بۆ دەوڵەتی عوسمانی[٨٨]، لە دوای کودەتایی ژوونی تورکەکان لە ساڵی ١٩٠٨ دا گفتوگۆ و هەوڵەکانی نێوان چێستەر و دەوڵەتی عوسمانی فراوانتر دەبێت.

* ئەنجام:

* لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا ویلایەتی موسڵ بەگشتی و کەرکوك بەتایبەتی جێی بایەخ و گرنگی دان بووە لەلایەن دەسەڵاتداران و کەسایەتی تایبەت و جێولۆجییەکان و ڕۆژنامەوانەکان و ئەفسەرانی سوپای زلهێزەکانەوە، کە چەندین ڕاپۆرت و زانیاری تەواویان داوە بەدەستەوە، لە ئەنجامی ڕاپۆرتی ئەو پسپۆڕانەشدا بەتایبەتی بە پێی زانیارییەکانی ناو نەخشەی ماونسلدا، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە بوونی مەیدانەکانی نەوت لە میزۆپۆتامیا هەمووی دەکەوێتە بەشی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلەوە، ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە زۆربەی مەیدانەکانی نەوت لە میزۆبۆتامیا بە پێی ڕاپۆرتی جێولۆجییەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم هەمووی دەکەوێتە ناوچەی باشووری کوردستان، هەروەها بە پێی ئەم زانیارییانە گرنگترین مەیدانەکانی ناوچەی باشووری کوردستانیش کێڵگە نەوتییەکانی باباگوڕگوڕە لە کەرکوك.

* یەکەم لایەن کە سوودی لەم زانیارییانە وەرگرت دەوڵەتی عوسمانی بوو بە تایبەتی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم. ئەوەتا سوڵتان فەرمانێك دەردەکات لە ساڵی ١٨٩٠ز بۆ گواستنەوەی ئەم ناوچە نەوتییانە بۆ سەر گەنجینەی تایبەتی خۆی، لە ساڵی١٨٩٩ فەرمانێکی تر دەردەکات، کە هەردوو ناوچەکانی ویلایەتی موسڵ و بەغدای لە خۆگرتبوو، لە ساڵی١٩٠٣ز فەرمانێکی شاهانە دەردەکات بەهەمان چەشنی فەرمانەکانی تر، ئەم فەرمانانەی سوڵتان گەورەترین بەڵگەن کە دەسەڵاتدارانی عوسمانی گرنگییەکی زۆریان داوە بە نەوتی ویلایەتی موسڵ لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، یەکەم دەستبەسەراگرتنی ناوچە نەوتییەکانی کوردستانە لەلایەن دەسەڵاتدار و حاکمی ئەو سەردەمەدا.

* هەرچەندە دەوڵەتانی زلهێزی وەك بەریتانیا، ئەڵمانیا، فەرەنسا، ڕوسیا و ئەمریکا لە ململانێیدا بوون بۆ وەرگرتنی مافی کارکردنی پرۆژەی هێڵە ئاسنییەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام لەم قۆناغەدا بەرژەوەندی تایبەتی ئەڵمانیا و ئەمریکا لە وەرگرتنی ئەم جۆرە پرۆژانە تەنها بۆ دەسکەوتنی ئیمتیازی نەوتی باشووری کوردستان و بەتایبەتی کانە نەوتییەکانی کەرکوك بوو. جگە لەوەش سیاسەتی بەریتانیا زۆر بە ئاشکرا دەردەکەوێت بۆ دەسکەوتنی کانە نەوتییەکانی ویلایەتی موسڵ دوای لایەنگیری و پشتیوانیکردنی لە هەوڵەکانی دارسی بۆ دەسکەوتنی ئیمتیازی نەوتی ئەم ناوچانە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە.

*** سەرچاوە و پەراوێزەکان:-**

(١)بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی تێپەربوونی سەرمایەی ئەوروپی لەناو دەوڵەتی عوسمانی لە نیوەی دووەمی سەدەی ١٩دا، تاکو جەنگی جیهانی یەکەم، بڕوانە: خليل علي مراد:"تغلغل الرأسمال الأجنبي في الدولة العثمانية ١٨٥٤-١٩١٤"، دراسات تركية، العدد٢، السنة الأولى، كانون الاول١٩٩١، ص١٣٣-١٦٤.

* لە راستیدا ئەم بانکە لە ساڵی ١٨٥٦، لە دەوڵەتی عوسمانی دامەزرا، بە ناوی (بانکی عوسمانیOttoman Bank) بە سەرمایەی ئینگلیزی بەبڕی یەك ملیۆن پاوەنی ئەسترلینی، لە ساڵی ١٨٦٣ بە فەرمانێکی سوڵتانی عوسمانی ئەم بانکە گواسترایەوە بۆ بانکی دەوڵەت بەناوی (بانکی شاهانەی عوسمانی)، هەروەها سەرمایەکەی بەرزبووەوە بۆ ١٠ملیۆن پاوەن، لە دوای بەشداربوونی فەرەنسا لەم بانکە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: المصدر نفسه، ص١٥٢-١٥٣.

(٢) غانم محمد علي: النظام المالي العثماني في العراق (١٨٣٩-١٩١٤)، رسالة ماجستير، كلية الآداب، جامعة الموصل، ١٩٨٩، ص١٩٠.

(٣) محسن الموسوي: النفط العراقي (دراسة وثائقية من منح الإمتياز حتى التأميم)، بغداد، ١٩٧٣م، ص ١٩.

(٤) محمد سهيل طقوش: تأريخ العثمانيين (من قيام الدولة إلى الإنقلاب على الخلافة)، ط٢، بيروت، ٢٠٠٨، ص٤٦٣-٤٦٤.

(٥) Jonathan S.McMurray ،Distant Ties:Germany ،the Ottoman Empire and the Construction of the Baghdad Railway- London- ،٢٠٠١p. ١٧.

(٦) کامەران ئەحمەد محەمەد: کوردستان لەنێوان ململانێی نێودەوڵەتیی وناوچەییدا(١٨٩٠-١٩٣٢)، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٥٥.

(٧) كاظم هاشم النعمة: العلاقات الدولية، الموصل، ١٩٨٢، ص١٢٢.

(٨) عبدالرؤوف سنو: ألمانيا والإسلام في القرنين التاسع عشر والعشرين، بيروت، ٢٠٠٧، ص ص٣٩-٤٠; هەروەها بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی پێشکەوتن و گەشەسەندنی ئابووری لە بوارە جیاجیاکان لە ئەڵمانیا، بڕوانە: William Eangdahl: Acentury of war. Anglo-American Oil Politics and the new world order. London. ١٩٩٢. pp.١٠-١٥.

(٩) عبدالرئوف سنو: المصدر السابق، ص٤٠.

(١٠) المصدر نفسه، ص٤٠.

* هیلموت ڤۆن مولتکە: سەرکردەیەکی سەربازی بڕووسی ئەڵمانیا بوو(١٨٠٠-١٨٩١)، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم راپۆرتێکی بڵاوکردەوە و پێشنیاری دامەزراندنی هێڵی شەمەندەفەری کرد، کە زەوییەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی ببەستێتەوە بە ئەڵمانیاوە، هەروەها دەسەڵاتی بگاتە ئاسیای بچووك بۆ گەیشتن بە قەفقاس و میزۆپۆتامیا و کوردستان و هیند... بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبدالحميد العلوجي وخضير عباس اللامي: الاصول التأريخية للنفط العراقي، ج١، بغداد، ١٩٧٣، ص٧٢.

(١١) محمد سهيل طقوش: المصدر السابق، ص٤٦٤; ئەم زاراوەیە (ئاراستە بەرەو رۆژهەڵات Drang Nach Osten ) لە روانگەی ئەو سیاسەتە نوێیەی، کە ئەڵمانیا باوەڕی پێی بوو، بەتایبەتی لەنێوان ساڵانی ١٨٩٠-١٩١٤ کە هێزو دەسەڵاتەکەی لە ئەوروپادا بەرچاوکەوت، لەنێوان ساڵانی ١٩٣٨-١٩٤١، بەتایبەتی کاتێك حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی ئەڵمانیا باوەڕیان بە سیاسەتی (فراوانخوازی بەرەو رۆژهەڵات) هەبوو، بڕوانە- Michael Graham Fry& Others: Guide to International Relations and Diplomacy. London. ٢٠٠٢. pp.٤٢٠-٤٢٣.، لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە ئامانج لە فراوانخوازی بەرەو رۆژهەڵات لە قۆناغی یەکەم ١٨٩٠-١٩١٤بە پلەی یەکەم بەرەو دەوڵەتی عوسمانی بوو بەڵام، لە قۆناغی دووەم ١٩٣٨-١٩٤١ رۆژهەڵاتی ئەوروپاو یەکێتی سۆڤیت ئامانجی سەرەکی فراوانخوازی عەقڵی ئەڵمانیا بوو.

(١٢) حكمت سامي سليمان: نفط العراق(دراسة إقتصادية سياسية)، بغداد، ١٩٧٩، ص ص٦٩-٧٠.

(١٣) حسن الموسوي: المصدر السابق، ص٢٠.

(١٤) عبدالحميد العلوجي وخضير اللامي:المصدر السابق، ص ٧٥.

(١٥) حكمت سامي سليمان: المصدر السابق، ص٧٤.

(١٦) يوسف ابراهيم يزبك: النفط مستعبد الشعوب، بيروت، ١٩٣٤، ص٧٧; نوري عبدالحميد خليل: التأريخ السياسي لإمتيازات النفط في العراق (١٩٢٥-١٩٥٢)، مطبعة الرابطة، بيروت، ١٩٨٠.، ص٢١.

(١٧) بەرواری ئەم فەرمانە جێی ناکۆکی بوو لەنێوان مێژووناسانی بواری نەوت، هەندێك مێژوونووس دەیگەڕێننەوە بۆ ساڵی ١٨٨٨ز، بڕوانە، فاضل حسين: مشكلة الموصل (دراسة في الدبلوماسية العراقية- الانكليزيه-التركية وفي الراي العام)، ط٣، مطبعة اشبيلية، بغداد، ١٩٧٧، ص٣٠٣; هەروەها عبدالفتاح ابراهيم: على طريق الهند، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ٢٠٠٤، ص١٧٨، هەندێکی تر پێیان وایە لە ساڵی١٨٨٩ز دەرچووە، بڕوانە: يوسف ابراهيم يزبك: المصدر السابق، ص٧٧، بەڵام بەپێی راپۆرتی لیژنەی بازرگانی فیدراڵی ئەمریکی (Federal Trate Commission U.S.) کە لە ٢٣ی ئابی ساڵی١٩٥٢ بڵاوکراوەتەوە دەربارەی کارتەلی جیهانی پەترۆڵ (International Petroleum Cartel) وا بۆی دەچێت، کە ئەم فەرمانە لە رووداوەکانی ساڵی ١٨٩٠ تۆمارکراوە، بڕوانە: دور إحتكار النفط الدولي في العراق (وهو الفصل الرابع من تقرير لجنة التجارة الاتحادية الاميركية عن إحتكار النفط الدولي)، بغداد، ١٩٦٠، ص٨.هەروەها هاوڕای ئەم بۆچوونە، اندره نۆسشی: الصراعات البترولية في الشرق الاوسط، ت/ اسعد محفل، دار الحقيقة، ط١، بيروت، ١٩٧١، ص ٢٢.; قاسم احمد العباس: وثائق النفط في العراق، ج١،

بغداد، ١٩٧٥، ص ٥٩. حكمت سامي سليمان:المصدر السابق، ص٧٣.

١٨) دەقی وەرگێڕانی ئەم فەرمانە لە زمانی تورکی بۆ زمانی عەرەبی وەرگیراوە لە، يوسف ابراهيم يزبك: النفط مستعبد الشعوب، ص ص٧٧-٧٨،

١٩) بڕوانە: سليم طه التكريتي:معركة النفط في العراق، ج١، بغداد، ١٩٥٢، ص ص ١٢-١٣.

٢٠) بڕوانە:ليام اندرسن وغاريث ستانسفيلد:ازمة كركوك السياسة الاثنية في النزاع والحلول التوافقية)، ت/عبدالاله النعيمي، بيروت، ٢٠٠٩، ص ٣٧.

(٢١)S.H.Longrigg. Oilinthe Middle East. oxfort Oxford University Press. (London-١٩٥٥). pp.-١٣ ١٤.

٢٢) فاضل حسين:المصدر السابق، ص٣٠٢ .

٢٣) عبدالحميد العلوجي وخضير اللامي:المصدر السابق، ص ٩٠.

٢٤) دور إحتكار النفط الدولي في العراق...، المصدر السابق، ص٨.

٢٥) ز.ي. هرشلاغ: مدخل إلى التأريخ الإقتصادي الحديث للشرق الاوسط، ت/مصطفى الحسيني، بيروت، ١٩٧٣، ص٦٦.

٢٦) دور إحتكار النفط الدولي في العراق...، المصدر السابق، ص٨.

٢٧) اندره نوسشي:المصدر السابق، ص٢٣.

٢٨) لە ڕاستیدا لە ساڵی ١٩٠٣ ماف دەدرێت بە ئەڵمانیا بەپێی ڕێککەوتنێك لەسەر پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا، بڕوانە: حكمت سامي سليمان: المصدر السابق، ص ص٧٩-٨٠.

(٢٩) خليل على مراد: التنافس الدولي على نفط ولاية الموصل قبل الحرب العالمية الأولى، مجلة اوراق موصلية، العدد٤، ٢٠٠٣، ص١٩.

(٣٠) عبدالحميد العلوجي وخضير اللامي: المصدر السابق، ص ٧٠.

(٣١) هارق اوكونور: الأزمة العالمية في البترول، ت/عمر المكاوي، دار الكاتب العربي للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٦٧، ص٣٧٠; نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص٢٠.

(٣٢)S.H. Longrigg: op. cit ، p١٤.

(٣٣) كمال مظهر احمد:كردستان في السنوات الحرب العالمية الأولى، بغداد، ١٩٧٧، ص٢١-٢٢.

(٣٤)S.H. Longrigg: op. cit ، p١٤; حكمت سامي سليمان:المصدر السابق، ص٧٠ ·

(٣٥) حكمت سامي سليمان:المصدر السابق، ص٧٤.

* کاپتن ماونسیل(F.R.Maunsell)، کە ئەفسەرێکی سوپای بەریتانیا بووە، لە ساڵی (١٨٨٨) دەستی کردووە بەگەڕان بە کوردستان و باکووری میزۆپۆتامیا، لە ساڵی(١٨٩٢) سەردانی دهۆك و ئامێدی و ناوچەی زێبار و هەولێر و موسڵی کردووە، لە دواییدا بووە بە کونسولگەری بەریتانیا لە وان(Van)، لە ساڵی(١٩٠١) بووە بە پاشکۆی سەربازی لە باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە ئەستانبوڵ، هەروەها پسپۆر بووە لە کاروباری ئەرمەنی و کوردیدا، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: Roger Adelson: Mark Sykes A portrait of an Amateur(London-١٩٧٥) pp.٦٦-١٠٠.

هەروەها، خليل علي مراد: (رحلات الأنكليز إلى الموصل في القرن التاسع عشر ومطلع القرن العشرين)، مجلة آفاق عربية، العدد٣/٤، اذار-نيسان ٢٠٠١، ص ٥٠.

(٣٦)F.R.Maunsell: The Mesopotamian Petroleum Field، The Geographical Journal، Vol.٩، No.٥ (May ١٨٩٧)، p.٥٢٨.

(٣٧) بۆ نەخشەی کێڵگە نەوتییەکانی میزۆپۆتامیا کە لەلایەن کاپتن ماونسیل ئامادەکراوە بڕوانە، دلشاد عمرعبدالعزيز: نەوتی کەرکوك و ململانێی زلهێزەکان (١٨٩٠-١٩٢٧)، نامەی ماستەر، کولێجی زانستە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠١٠، لە پاشکۆی ژمارە(١).

(٣٨)F.R.Maunsell: op. cit ، p.٥٢٨.

(٣٩)Ibid، p.٥٣٢.

(٤٠) محمد هادي الدفتر و عبدالله حسن: العراق الشمالي، ج١، مطبوعات النهار، بغداد، ١٩٥٨، ص١٩٥; عبدالمجيد فهمي حسن:دليل تأريخ مشاهيرالالوية العراقية (جزء لواء كركوك)، بغداد، ١٩٤٧، ص٤٩;عبدالرزاق الهلالي: معجم العراق، ج٢، دار الكشاف للنشر والطباعة، بغداد، ١٩٥٦، ص ص٥-٦;مير بصري: مباحث في الإقتصاد العراقي، شركة التجارة والطباعة المحدودة، بغداد، ١٩٤٨، ص٧٣;عبدالحميد العلوجي وخضير عباس اللامي، المصدر السابق، ص٣٠.

(٤١) محمد هادي الدفتر و عبدالله حسن: المصدر السابق، ص١٩٥; عبدالمجيد فهمي حسن: المصدر السابق، ص٤٩.

(٤٢) بڕوانە: مير بصري:المصدر السابق، ص٧٣; محمد هادي الدفتر و عبدالله حسن: المصدر السابق، ص١٩٥; عبدالمجيد فهمي حسن: المصدر السابق، ص٥٠; عبدالحميد العلوجي وخضير عباس اللامي:المصدر السابق، ص٣٠;عبدالرزاق الحسني: عراق قديماً وحديثاً، ط٣، مطبعة العرفان، صيدا، ١٩٥٨، ص٥٣.

(٤٣) بڕوانە: محمد هادي الدفتر و عبدالله حسن: المصدر السابق، ص١٩٥; عبدالمجيد فهمي حسن: المصدر السابق، ص٥٠.

(٤٤) بڕوانە، دڵشاد عمرعبدالعزيز: سەرچاوەی پێشوو، پاشکۆی ژمارە(١).

(٤٥) يوسف ابراهيم يزبك: المصدر السابق، ص٨٠.

(٤٦) المصدر نفسه، ص٨٠.

(٤٧) نجدة فتحي صفوت: العراق في مذكرات الدبلوماسيين الاجانب، بيروت، ١٩٦٩، ص٥٥.

(٤٨) عبدالحميد العلوجي وخضير اللامي:المصدر السابق، ص ٩٦.

(٤٩) S.H Longrigg:op. cit. p١٤;. اوبنهایم مێژوونووس و زانای شوێنەوار ویەکێك بوو لە پیاوانی هەواڵگری ئەڵمانیا، ولەنێوان ساڵانی ١٨٦٠-١٩٤٦ ژیانی بەسەر

بردووە، یەکێك لە بە ناوبانگترین کتێبەکانی بەناو(کۆچەر)، کە ئینسکلۆپیدیاکی فراوانە و تەنیایە لە بارەی ژمارەیەکی زۆر لە خێڵەکانی رۆژهەڵاتی عەرەبی و ئەنادۆڵ، هەروەها ئەم کتێبە وەرگێڕاوتە سەر زمانی عەرەبی لە سێ بەرگدا.

* مەتران ئەدی شێر: لە پیاوانی لاهوتی کلدان بوو، لە ساڵی ١٨٦٧ لەدایکبووە لە ناوچەی شەقڵاوە، لە ساڵی ١٩١٥بەدەستی تورکەکان کوژراوە لە یەکێك لە گوندەکانی سەعرەت، بڕوانە، عبدالحمید العلوجي وخضیر اللامي:المصدر السابق، ص٩٨.

(٥٠) لە راستیدا مەتران ئەدی شێر لە ساڵی ١٩٠٠ ئەم زانیارییانەی لە وتارێکدا بەناونیشانی(سەرچاوەی نەوت لە باباگورگور لە گۆڤارێکی بیروتی بە ناوی (المشرق) بڵاوکردووتەوە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، المصدر نفسه، ص ص٩٩-١٠٠.

(٥١) حکمت سامي سلیمان، المصدر السابق، ص٦٩.

(٥٢) المصدر نفسه، ص٨٠.

(٥٣) Edward W. Chester: United States Oil Policy and Diplomacy ،Greenwood publishing Group ،United States ،١٩٨٣ ،p. ٢١٦.

(٥٤) سلوی سعد الغالبي: العلاقات العثمانیة الامریکیة(١٨٣٠-١٩١٨م)، القاهرة، ٢٠٠٢، ص ص٢٢٥-٢٢٦.

(٥٥) بڕوانە: سلیم طه التکریتي: معرکة النفط في العراق...، ص ص ١٤-١٥; هارق اوکونور: المصدر السابق، ص٣٧٠.

(٥٦) ئەم زانیارییانە لە ناوەرۆکی راپۆرتی پاول رۆهەرباغ هاتوون، کە لە ١٩٠٠-١٩٠١ لە کاتی سەردانیدا بۆ ناوچەی باباگورگور ئامادەی کردووە، بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە، دلشاد عومەر عەبدولعەزیز: سەرچاوەی پێشوو، وێنەی راپۆرتی باول رۆهەرباغ بەشی تایبەتی کەرکوك لە پاشکۆی ژمارە(٧) بە زمانی ئەڵمانی.

(٥٧) F.R.Maunsell: op. cit ،p٥٢٨.

بەڵام دوای جەنگی جیهانی دووەم ئەم بۆچوونە راستکرایەوە وروونیان کردووە، کە مەیدانەکانی نەوت هیچ پەیوەندییەك نییە لەنێوانیاندا، بەڵکو نەوت لەژێر زەویدا لە شێوەی قوبەی تایبەت دایە و هەر قوبەیەك جیاوازە لەوەی تر، ئەم تێورەش بە تێوری قوبە ناسراوە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ا.باکیروف: الاسس النظریة للبحث والتنقیب عن البترول والغاز، ت: سمیررياض، دار میر للطباعة والنشر، موسکو، د.ت، ص ص٢٢-٢٤; ریتشارد سیلي: اساسیات جیولوجیا البترول، ت/فاضل السعدني، دار الامل للنشر والتوزیع، الاردن، ١٩٩٤، ص ص٦-٩.

* ئەم کەسایەتییە H.E.Nichols لە دوارۆژدا دەسەڵاتی خۆی دەچەسپێنێ لەسەر بەڕێوبەردنی کۆمپانیای نەوتی تورکی، هەروەها کۆمپانیای ئەنگلۆ_ فارسی، بڕوانە: S.H. Longrigg: op.cit, p.٢٨.

(٥٨) نوري عبدالحمید خلیل: المصدر السابق، ص٢٣.

(٥٩) محەمەد فەرید پاشا افلونیالی(١٩٠٣-١٩٠٨) پۆستی سەدری ئەعزەمی وەرگرتبوو لە ئەفلۆنیالی عوسمانی، بڕوانە، یلماز اوزتونا: تاریخ الدولة العثمانیة، ت/عدنان مڤحموود سلمان، المجلد ٢، استانبول، ١٩٩٠، ص١٢٦.

(٦٠) دور إحتکار النفط الدولي في العراق...، ص٨.

(٦١) قاسم احمد العباس: المصدر السابق، ص٦٠.

(٦٢) نوري عبدالحمید خلیل: المصدر السابق، ص٢٣.

(٦٣) قاسم احمد العباس: المصدر السابق، ص٩٥.

(٦٤) حکمت سامي سلیمان: المصدر السابق، ص٨١.

(٦٥) خلیل علي مراد: التنافس الدولي...، ص٢٢.

(٦٦) بڕوانە پەراوێزی (٥٧).

(٦٧) اندره نۆسشي: المصدر السابق، ص ٢٤.

(٦٨) Valentine Chirol: The Middle Eastern Question or Some Political Problems of Indian defence، London، ١٩٠٣، p. ٢٠٠.

(٦٩) لە ئامادەبووانی سەرمایەدارەکانی ئەڵمانی لەم رێککەوتنە ئارسەر ڤۆن کفنەر(Arthur v.Giwinner) بەڕێوبەری بانکی ئەڵمانی، و کورت زاندر(Kurt Zander) بەڕێوبەری کۆمپانیای هێڵی ئاسنی ئەنادۆڵ، هەروەها ئێدورد هوگینین(Edouard Huguenin) بەڕیوبەری کۆمپانیای هێڵی ئاسنی بەغدا بوون. بڕوانە، Dietrich Eichholtz: Die Bagdadbahn, Mesopotamien und die deutsche Ölpolitik ١٩١٨, Leipziger Universitätsverlag-٢٠٠٧, p.١٢.

(٧٠) Helmut Mejcher:Imperial Quest for oil (١٩١٠-١٩٢٨)-Iraq، London، ١٩٧٦، p.٤.

(٧١) Dietrich Eichholtz: op.cit, p.١٢.

(٧٢) اندره نۆسشي: المصدر السابق، ص ص ٢٤-٢٥.

(٧٣) ماریان کنت: النفط والامبراطوریة، ت/قاسم احمد العباس، مجلة النفط والتنمیة، العدد٥، شباط ١٩٧٩، بغداد، ص ١٨٢; بانکی ئەڵمانی ئەندازیاری ئیتاڵی دکتۆر سیزر بورۆ(Ceasare Porro) وەك سەرۆکی ئەم شاندە هەڵبژارد، هەروەها دوو پرۆفیسوری تر ناویان لە راپۆرتی ئەم شاندە هاتبوو کە پرۆفیسۆر کیسلنك(Kissling)دانیشتووی شاری بێرنی سویسری بوو، هەروەها پرۆفیسۆر هۆگو بوکنگ(Hugo Bücking) کە دانیشتووی ستراسبۆرك بوو، لەگەڵ نوێنەری بانکی ئەڵمانی دکتۆر کفاونت (Quandt Dr.). Dietrich Eichholtz: op.cit, p.١٥

(٧٤) گۆران ابراهیم صالح: کەرکوك لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا(١٨٧٦-١٩٠٩)، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل١٧٥.

(٧٥) Dietrich Eichholtz: op. cit، p.١٦

(٧٦) Ibid, pp.١٥-١٦.

(٧٧) لە راستیدا تەنها ١٢نامە ئاڵوگۆڕکرا لەنێوانیدا، بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی دەقی ئەم نامانە بڕوانە، ماریان کنت: النفط والامبراطوریة، ت/قاسم احمد العباس، مجلة النفط والتنمیة، العدد٥، شباط ١٩٧٩، بغداد، ص ص ١٨٢-١٨٣.

(٧٨) S.H.Longrigg: op.cit، p٢٨; Habibollah Atarodi:Great Powers، Oil&The Kurds in Mosul (Southern Kurdistan / Northern Iraq

١٩١٠-(١٩٢٥، New York، ٢٠٠٣، p.٣٢.

٧٩) ماریان کنت:المصدر السابق، ص١٨٣.

(٨٠)Dietrich Eichholtz: op. cit، p.١٦.

٨١) هەر لە هەمان ساڵ کۆمپانیای رۆیاڵ دۆچ/شێڵThe Royal Dutch-Shell Oil Co. دامەزرا لە ساڵی ١٩٠٧ لە ئەنجامی تێکەڵبوونی کۆمپانیای رۆیاڵ دۆچی هۆڵەندی بە سەرۆکایەتی (هێنری دیترنگ) لەگەڵ کۆمپانیای شێڵ بەریتانی بە سەرۆکایەتی (مارکۆس ساموێل)، پشکەکانی کۆمپانیا کە دابەشکرا بە شێوەی ٦٠٪ بۆ بەرژەوەندییەکانی هۆڵەندی و ٤٠٪ بۆ بەرژەوەندییەکانی بەریتانی، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مصطفى خليل: تطور الصراع نحو السيطرة على البترول العالمي، مشأة المعارف، اسكندرية، ١٩٧٠، ص ص٦٥٤-٦٦١.

(٨٢)S.H.Longrigg: op. cit، p٢٨ ; Daniel Yergin: op. cit، p١٨٧.

٨٣) نوري عبدالحميد خليل:المصدر السابق، ص٢٢.

٨٤) كمال مظهر احمد: اضواء على قضايا دولية في الشرق الاوسط، بغداد، ١٩٧٨، ص ٣٧.

(٨٥)John A.Denovo: American Interests and Policies in the Middle East ١٩٠٠-١٩٣٩ (Minneapolis -١٩٦٣) p.٦١; Edward W. Chester. op. cit، p. ٢١٦.

(٨٦)Brian Stuart McBeth: op. cit، p. ٧.

(٨٧)John A.Denovo: op. cit، p.٦٠ ; سلوى سعد الغالبي: المصدر السابق، ص٢٢٦

(٨٨) سلوى سعد الغالبي: المصدر السابق، ص٢٢٦؟

* لە راستیدا ئەم بانکە لە ساڵی ١٨٥٦، لە دەوڵەتی عوسمانی دامەزرا، بە ناوی(بانکی عوسمانیOttoman Bank) بەسەرمایەی ئینگلیزی بەبڕی یەك ملیۆن پاوەنی ئەسترلینی، لە ساڵی ١٨٦٣ بە فەرمانێکی سوڵتانی عوسمانی ئەم بانکە گواسترایەوە بۆ بانکی دەوڵەت بەناوی (بانکی شاهانەی عوسمانی)، هەروەها سەرمایەکەی بەرزبووەوە بۆ ١٠ملیۆن پاوەن، لە دوای بەشداربوونی فەرەنسا لەم بانکە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: المصدر نفسه، ص ص١٥٢-١٥٣.

** هیلموت ڤۆن مولتکە: سەرکردەیەکی سەربازی برووسی ئەڵمانیا بوو(١٨٠٠-١٨٩١)، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم راپۆرتێکی بڵاوکردەوە و پێشنیاری دامەزراندنی هێڵی شەمەندەفەری کرد، کە زەوییەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ببەستێتەوە بە ئەڵمانیاوە، هەروەها دەسەڵاتی بگاتە ئاسیای بچووك بۆ گەیشتن بە قەفقاس ومیزۆپۆتامیا وکوردستان و هیند...، بۆ زانیاري زياتر بڕوانە: عبدالحميد العلوجي وخضير عباس اللامي:الاصول التأريخية للنفط العراقي، ج١، بغداد، ١٩٧٣، ص٧٢.

*** کاپتن ماونسیل(F.R.Maunsell)، کە ئەفسەرێکی سوپای بەریتانیا بووە، لە ساڵی (١٨٨٨) دەستی کردووە بەگەڕان بە کوردستان وباکووری میزۆپۆتامیا، لە ساڵی(١٨٩٢) سەردانی دهۆك وئامێدی وناوچەی زێبار وهەولێر وموسڵی کردووە، لە دواییدا بووە بە کونسوڵگەری بەریتانیا لە وان(Van)، لە ساڵی(١٩٠١) بووە بە پاشکۆی سەربازی لە باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە ئەستانبۆڵ، هەروەها پسپۆڕ بووە لە کاروباری ئەرمەنی وکوردیدا، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: Roger Adelson: Mark Sykes A portrait of an Amateur(London-١٩٧٥) pp.٦٦-١٠٠. هەروەها، خليل علي مراد:(رحلات الأنكليز إلى الموصل في القرن التاسع عشر ومطلع القرن العشرين)، مجلة آفاق عربية، العدد٣/٤، اذار-نيسان ٢٠٠١، ص ٥٠.

**** مەتران ئەدی شیر: لە پیاوانی لاهوتی کلدان بوو، لە ساڵی ١٨٦٧ لەدایکبووە لە ناوچەی شەقڵاوە، لە ساڵی ١٩١٥بەدەستی تورکەکان کوژراوە لە یەکێك لە گوندەکانی سەعرەت، بڕوانە، عبدالحميد العلوجي وخضير اللامي:المصدر السابق، ص٩٨.

*** کاریگەری پرسی نەوتی باشووری کوردستان لەسەر هەردوو ڕێککەوتننامەی (سیڤەر) و (لۆزان)دا**
**(لە ئابی ١٩٢٠ تاکو تەمموزی١٩٢٣)**

**د. دڵشاد عومەر عەبدولعەزیز**

گرنگی نەوتی باشووری کوردستان و بەشێوەیەکی تایبەت نەوتی کەرکوك ڕۆڵێکی گەورەی دەبێت لە سەر هەردوو ڕێککەوتننامەی (سیڤەر) و(لۆزان)دا، چونکە گرنگی ئابووری و ستراتیژی وەك دوو هۆکاری یەکلاکەرەوە دەبێت لە بەردەم ڕەوتی سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر بە دۆزی کورد لە دوای چەسپاندی سیاسەتی ماندێت لە سەر ناوچەکەدا بە پێی ڕێککەوتنی سان-ریمۆ لە ٢٥ نیسانی ١٩٢٠.

بوونی سامانی نەوت بە بڕێکی زۆر لە ناو خاکی کوردستان لەلایەك ولەلایەکی تریشەوە مەترسی ئەگەری دروستبوونی دەوڵەتی کوردستان، ئەم دوو هۆکارە وای لە سیاسەتی بەریتانیا کرد، کە لە بەرامبەر پاڵپشتیکردن لە پرۆژەی دروستکردنی دەوڵەتی کوردستان بەگۆڕدرێت[1].

لە ڕاپورتێکی دەستەی ئەرکانی دەریایی بەریتانیا ئاماژە بە ڕاگەیاندنی (والتەر لۆنگ) لەبەردەم ئینستوتی تەکنەلۆجیایی پترۆڵ لە ٢٣ مارسی ١٩٢٠ کراوە کە دەڵێت: "... ئەگەر بەریتانیا ئەم سوودو چانسەی لەبەردەست دایە، نەیقۆزێتەوە، کە لەسەر ئەو زەویانەی پڕ لە نەوت ولە ژێر دەستمانە، ئەگەر نەکرا، ئەوا لەم کاتە زێرینەدا ناتوانین بیخەینە سەر ئەستۆی (کەمتەرخەمی) و تەمەڵی لە کارەکانماندا، چونکە لە سوودی نیشتمانی گەورەدایە، دەبێت بەبەرپرسیارێتی کاری بۆ بکرێت، هەروەها ئاوڕلێدانەوەو چاودێریکردنی باش بکرێت لە داگیرکردنی ئەم ناوچانەدا. هەندێکی تر دەڵێن وەك ئەوەبێت کە کلیلی چارەسەری پێبێت بۆ هەموو سەرکەوتن و خۆشگوزەرانی لە ئایندەدا"[2] مەبەستی لۆنگ لەم ڕاپۆرتەدا ئەوەیە ناوچەی ویلایەتی موسڵ لەپاڵ ناوچەکانی تری میزۆپۆتامیا وەك کلیلی چارەسەری سەرکەوتن و خۆشگوزەرانییە بۆ ئایندەی بەریتانیا، بەرپرسیارێتی دەخاتە ئەستۆی دەسەڵاتدارانی بەریتانیا بۆ باشتر کۆنترۆڵکردنی، ئاماژە بە مامەڵەی باشتر دەکات بۆ دانیشتووانی ئەم ناوچەیە.

بۆیە ئەگەر سەیری سیاسەتی بەریتانیا بکەین بەرامبەر بە دۆزی کورد لە باشووری کوردستان لە ڕاگەیاندنی هەردوو زلهێزی بەریتانیا و فەرەنسا لە ٧ تشرینی دووەمی ١٩١٨ بۆ ئازادیی گەلانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی تەنها کورد نەبێت لەنێوان ئەم گەلانەدا کە هیچ ئازادییەکی بەخۆوە نەبینی بۆ دروستکردنی دەوڵەتێك[3] هەروەها لە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس ڕێگایان لە داخوازییەکانی گەلی کورد لە باشووری کوردستان گرت بگەیەنرێتە کۆنفرانسەکە[4] لەوکاتەی سیاسەتی ماندێت چەسپا بە پێی سان-ریمۆ لە ساڵی (١٩٢٠) زلهێزەکان ئامادەنەبوون باشووری کوردستانیش وەك ناوچەکانی تر بخەنە ژێر ماندێتی خۆیان[5].

*** ڕێککەوتننامەی سیڤەرو پرسی نەوتی ویلایەتی موسڵ:**

دوابەدوای سان-ریمۆ ڕەوتی ڕووداوەکان دەگۆڕدرێت وجارێکی تر زلهێزەکان بەڵێن دەدەن بە دانیشتووانی کوردستان بۆ ڕێگا چارەیەکی نەتەوەیی، بەڵام ئایا ئەم ڕێگایە بە قازانج و سوودی نەتەوەی کوردستان دەبێت یاخوود بەرژەوەندییە نەوتییەکانی زلهێزەکان لەم ناوچەیە، ڕووداوەکان بەرەو پارچە پارچەبوونی دەبەن لەنێوان دەوڵەتە هەرێمییەکانی تازە دامەزراودا.

زلهێزەکانی جیهان جارێکی تر کۆدەبنەوە لە شاری سیڤەر نزیك پاریس، بە بەشداربوونی هەریەك لە (بەریتانیا، فەرەنسا، ئیتالیا، ژاپۆن، بەلژیکا، یۆنان، ڕۆمانیا، پۆرتوگال، چیك و سلۆڤاکیا، حیجاز، ئەرمینیا، لەلایەکی تریش دەوڵەتی عوسمانی) بۆ مۆرکردنی پەیمانێك بە ناوی (پەیمانی سیڤەر- Treaty of Sevres) لە ١٠ ئابی ١٩٢٠، کە لە ناوەرۆکدا لە ١٣ دەروازەو ٤٣٣ بەند پێکهاتبوو[6].

دۆسییەی کوردستان یەکێك بوو لەو دۆسیانەی پەیمانی سیڤەر لە هەوڵی تاوتێکردنی بوو، تاکو لە کۆتاییدا بە شێوەیەك چارەسەرێکی بۆ دانرا لە سیستەمێکی سیاسی دیاریکراودا، بۆ خۆبەڕێوەبردنی گەلی کورد بەپێی بنەمای ماف چارەی خۆنووسین لە چوارچێوەیەك، کە لەم پەیمانەدا بۆ کورد تەرخانکرابوو، خۆی لە بەندەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤)دا دەنواند[7]، کە ماف درابوو بە کورد بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە بەشی تورکیا، هەروەها کوردەکانی ویلایەتی موسڵ ماف ئەوەیان هەیە بەپێی خواستی خۆیان بچنە ناو ئەو دەوڵەتە کوردییەوە[8]، بەڵام بەریتانییەکان ئامادەنەبوون ڕێگا بدەن بە دانشتوانی ئەم هەرێمە بریاری خۆیان بدەن دەربارەی ئەم پرسە، هەروەها (کرزن) زۆر بە توندی هەڵوێست دەنوێنێت لە کاتی گفتوگۆکاندا لەگەڵ نوێنەرانی هاوپەیمانەکان، دەڵێت:"کوردەکانی باشوور ئارەزووی جیابوونەوەیان نییە لە ویلایەتی موسڵ دا"[9].

هەرچەند پەیمانی سیڤەر بۆ یەکەمین جار لە مێژووی یاسای نێودەوڵەتیدا، بەڵگەنامەیەکی یاسایی و سیاسییە، کە ڕاستەوخۆ باسی لە کێشەی کوردی کردووەو نەخشە ڕێگای بۆ داناوە[10] بەڵام لە بەندەکانی وا دەردەکەوێت، کە خوودی ئەم پەیمانە کوردستانی بەرەو دابەشبوون دەبردو پارچە پارچەی دەکرد[11].

لە ئەنجامی پەیمانی سیڤەر دا کەرکوك وەك لیوایەکی گرنگی ویلایەتی موسڵ ماف هەبوو وەك لە بەندی (٦٤) هاتبوو، کە دانیشتووانەکەی بە ئارەزووی خۆیان بچنە ناو ئەو دەوڵەتە کوردییەوە، بەڵام سیاسەتی بەریتانیا لەم ناوچەیە بە پێچەوانەی ناوەڕۆکی ئەم بەندە کاریان دەکرد[12].

هەرچەندە پەیمانی سیڤەر بەفشار بۆ سەر حکومەتی عوسمانی لاوازی ئەوکاتەدا پرکرایەوە، بەڵام ئەم پەیمانە بە شێوەیەکی یاسایی بە ڕێککەوتنی سان-ریمۆو خاڵەکانی ئەم ڕێککەوتنە دوورنەبوو لە دارشتنەوەی لەناو سیڤەردا[13]. ئەوەی شایانی باس بێت لە بەشی چوارەمی ئەم پەیمانەو بەندەکانی (٣١٠-٣١٥) تایبەت بوون بە پرسی نەوت و

بەتایبەت نەوتی کوردستان، کە لە ناوەڕۆکی بەندی (٣١٠) هاتبوو:" هەموو ئەو ئیمتیازانەی لەسەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی دابوون، بە بڕیاری حکومەتی عوسمانی بەخشرابوون، پێش بەرواری ٢٩ تشرینی یەکەمی ١٩١٤، هەمووی لە ڕووی یاساییەوە ڕاستو دروستن‌و دەبێت بەردەوام بێت لە کاریگەری دا، هەروەها لە ئەستۆی حکومەتی عوسمانی دایە، کە موڵەتی کارکردنی ئەم ئیمتیازانە نوێی بکەنەوە، کە لە کاتی جەنگدا وەستا بوون..."، هەروەها لە ناوەڕۆکی بەندی (٣١١) هاتبوو: "ئەو کۆمپانیا نەوتییانەی بەر لە ٢٩ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٤، ئیمتیازی نەوتیان بەڕێگەی یاسایی وەرگرتووە، دەبێت ڕێگایان پێبدرێت هەموو مافەکانی خۆیان بپارێزن، ئەو مافانەشیان بۆ دابین بکرێت، کە پێشتر لەسەری ڕێککەوتبوون"[١٤].

ئەم دوو بەندە زیاتر بەرژەوەندییەکانی بەریتانیاو فەرەنسایان دەگرتەوە، بە پلەی یەکەمیش بەریتانیا، بەڵام ئەمریکییەکان لەم قۆناغەشدا خۆیان بە بەشخووراو دەزانی[١٥].

هاوکات لەگەڵ ڕاگەیاندنی پەیمانی سیڤەر بەو هەموو کەموکوڕی‌و گۆرانکارییانەی تێیدا بوو، ململانێ‌و ناکۆکی لەنێوان وڵاتە زلهێزەکان (بەریتانیا، فەرەنسا، ئەمریکا) زیاتر دەبوو، بەتایبەتی، کە بەریتانیا بەرژەوەندییەکانی سەقامگیرتر بوو لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، زلهێزەکانی تر لەگەڵ دەوڵەتە هەرێمییەکان زیاتر زەرەرمەند بوون، بەتایبەتی لە نەوتی ویلایەتی موسڵ، لە ئەنجامدا سیاسەتی بەریتانیا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گۆرانکاری گەورەی بەسەرردێت، بەهۆی چەند کۆسپ‌و گرفتێك، کە لەلایەن زلهێزەکان‌و ڕووداوەکانی ناوچەکەدا، کە زیاتر مەترسی دەبێت لەسەر بەرژەوەندیی بەریتانیا لە ویلایەتی موسڵ‌و فاکتەرە نەوتەکەیدا. ڕووداوەکانی دوای پەیمانی سیڤەر بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

١. لە هاوینی ساڵی (١٩٢٠) دانیشتوانی هەر سێ ویلایەتی میزۆپۆتامیا دەست دەکەن بە شۆڕش لە دژی دەسەڵاتی بەریتانیای داگیرکەردا، کە تاکو پایزی هەمان ساڵی خایاندبوو، کۆسپ‌و گرفتی زۆری بۆ دەسەڵاتدارانی بەریتانیا خستەوە لە ناوچەکەدا[١٦] لە ئەنجامی ئەم باروودۆخەدا لە عێراق مەندووبی سامی بەریتانیا لە ڕۆژی ٢٥ تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٠) حکومەتی عێراقی بە سەرۆکایەتی (عەبدولرەحمان نەقیب) دامەزراند[١٧].

٢. سەرهەڵدانی بزوتنەوەی کەمالستی، کە ڕابەرایەتی دەوڵەتی نوێی تورکیای دەکرد، وەك دەوڵەتێکی بەهێز سەری هەڵدا، بەتایبەتی دوای بڵاوکردنەوەی میساقی نیشتمانی لە ئەنجامی هەردوو کۆنگرەی سیواس‌و ئەرزەڕووم، کە دامەزراندنی حکومەتی لێکەوتەوە لە ئەنقەرە لە نیسانی ١٩٢٠ بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال پاشا، کە بەندەکانی پەیمانی سیڤەری ڕەتکردەوە، هەروەها دانانی ڕەشنووسی پەیمانی هاورێیەتی سۆڤێتی-تورکی لە ٢٤ ئابی ساڵی (١٩٢٠)، لە ئەنجامی ئەو سەرکەوتنە بەرچاوەی سوپای یۆنانی لە جەنگی(سەقاریە) لە ئەیلولی ساڵی (١٩٢٠) بەدەستیهێنا[١٨]. ئەم ڕووداوانە کاریگەری گەورەیان هەبوو لەسەر ئاراستەو خواستەکانی سیاسەتی بەریتانیا لە ناوچەکەدا[١٩].

٣. ئەمریکاییەکان جارێکی تر خۆیان بەبەش خوراو زانی لەو دەستکەوتانەی دوای جەنگ لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات‌و بەتایبەتیش لە نەوتی موسڵ دا بەدەستهاتبوون، بۆیە ئەم جارە زۆر بە توندی یادداشتێکی نارەزایی لە ٢٠ تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٠) لەلایەن وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە ڕێگای باڵیۆزەکەیەوە لە لەندەن (دیڤس) ئاراستەی (لۆرد کرزن) کرا، کە لە ناوەڕۆکی دا هاتبوو: "ناتوانین نکۆڵی لەوە بکەین کە هەوڵ‌و دەنگوباسی سەرچاوەکانی پترۆڵ لە ویلایەتی موسڵ وەك بابەتێکی ململانێی ئابووری، ڕای گشتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو بەریتانیاو وڵاتانی تری سەرقاڵ کردەوە، ئەم سەرچاوانە بوونەتە دۆزێکی ئابووری هەڵپەسێردراو، کە سیستەمی ماندێتی لەپێناو دانراوە".

لەم یادداشتەدا هاتووە، کە ئەمریکاییەکان ماندێتی سەر عێراق لەلایەن بەریتانیا ڕەتدەکاتەوە، ئەگەر بەریتانیا سیاسەتی (دەرگایی کراوە) پەیڕەو نەکات‌و دابینکردنی پشکێك بۆ کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەمریکا لە نەوتی ویلایەتی موسڵ مسۆگەر نەکات[٢٠].

وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا لە وەڵامی یادداشتەکەی ئەمریکا لە ٢٨ شوباتی ساڵی (١٩٢١) ئاماژە دەکات بەوەی ئیمتیازی نەوتی ویلایەتی موسڵ‌و بەغدا لەلایەن حکومەتی عوسمانی بەخشراوە بە کۆمپانیای نەوتی تورکی بە بەڵێنی فەرمی پێش جەنگ، هەروەها ئەم ئیمتیازە بە شێوەیەکی ڕوون‌و ئاشکرا لە مادەی (٣١١)ی ڕێککەوتنی سیڤەردا جەختی لێوەکراوەتەوە. پاشان لە داهاتوودا حکومەتی عێراقی ئایندەدا سوودمەند دەبێت بە هۆی وەبەرهێنانی ئەم کەرەستەیە، چونکە مافی خاوەندارێتی هەیە لەم ناوچەیەدا، لەگەڵ ئاماژەکردن بەو بەڵگەنامانەی، کە پێشتر ڕوون کراوەتەوە بۆیان[٢١].

باروودۆخ لەم کاتەدا هیچ یارمەتی بەریتانیا نادا بۆ جێبەجێکردنی پلانەکانی بۆ دەستبەسەراگرتنی نەوتی میزۆپۆتامیا بە تەنها، کە لەلایەکەوە دەبوایە خاتری فەرەنسا ڕابگرێت بەرامبەر بەوەی دەست لە ویلایەتی موسڵ هەڵبگرێت، لەلایەکی تردا ئەمریکاییەکان بەردەوام داوای سیاسەتی (دەرگای کراوە)یان دەکرد، حکومەتی بەریتانیا دەیویست لە ڕێگای ماندێتی سەر عێراق دەستبەری بەرژەوەندییە ئابوورییەکان بکات، بەتایبەتی نەوت، بەڵام ئەو گۆرانکارییانەی لە ناوچەکەو جیهاندا ڕوویان دا، بەریتانیا گومانی لا دروست بوو، کە لەڕێگای ماندێتەوە بتوانێت بەرژەوندییەکانی خۆی جێبەجێ بکات[٢٢].

ئەوەی شایەنی باس بێت بەریتانیا تەنها بەرهەڵستی نەدەکرا لەلایەن هاوپەیمانانی لەسەر دەستبەرکردنی نەوتی میزۆپۆتامیا، بەڵکو لە ناو ڕای گشتی بەریتانیا نارەزایی هەبوو، کە زیاتر ترسناك تر بوو بۆ بەریتانیا لە

بەرهەڵستی دەرەوە. بەرهەڵستکارەکان لەسەر دوو ئاست کاریان دەکرد هەم لە پەرلەمان، هەم چەند رۆژنامەیەکی ناوخۆیی بەریتانیا بە تایبەتی (لۆرد نور سکلیف)، کە لە وتارەکانیدا درووشمی (دەست هەڵگرن لەسەر میزۆپۆتامیا) دەخستەروو[٢٣]. بەڵام حکومەتی بەریتانیا توانیبووی دەنگی بەرهەڵستکارەکان کپ بکاتەوە بەو ئامارەیەی، کە لە ژێر زەوی ویلایەتی موسڵ دەریاچەیەکی نەوت هەیە، کە ژیانی کەشتی گەلەکانی بەریتانیا لە دەریای ناوەراست بەندە لەسەری[٢٤]. بۆیە بەریتانیا لە پلان وسیاسەتی لە ناوچەکەدا بیر لە گۆرانکاری دەکاتەوە، هەروەها بیر لە دەست هەڵگرتنی سیاسەتی ماندێت دەکاتەوە، پەیوەندییەکانی لەگەڵ عێراق رێکدەخاتەوە بە شێوەیەکی نوێی تر، کە بەرژەوەندییەکانی بپارێزێت بەکەمترین نرخ، لە رێگای دامەزراندنی حکومەتێکی نیشتمانی کە خۆی لە پشتییەوە بشارێتەوە بۆ جێبەجێکردنی تەماحە کۆلۆنیالستەکان[٢٥].

بەریتانییەکان دەیانویست بە پەلە پلانەکانی خۆیان ئەنجام بدەن، وەك نووسەرێکی بەریتانی ئامارەی کردووە ونووسیوویەتی: "سیاسەتی کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ-فارسی وسیاسەتی دەرەوەی بەریتانیا، پێویستیان بەوەهەبوو شانشینی عێراق لەم سنوورەی ئێستادا دامەزرێنێت"[٢٦].

*** دامەزراندنی حکومەتی عێراق و راگەیاندنی خاوەندارییەتی نەوتی باشووری کوردستان:**

لە بەریتانیا وەزارەتێکی نوێ هاتەکایەوە بە ناوی وەزارەتی داگیرگاکان (Colonial Office) لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٢٠، لە جێگایی وەزارەتی هیند (India Office)، کە فەرمانگەیەکی تایبەتی بەناو (رۆژهەڵات) لێ دروست کرا، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی هەموو ئەو ناوچانەی لە بازنەی رۆژهەڵاتی ناوەراست بوون. یەکێك لەو کێشانەی پێی سپێردرابوون بەرێوەبردنی کاروباری عێراق و بریاردان بوو لەسەر شێوەی دەسەڵات لەم ناوچەیەدا. لێپرسراویەتی ئەم وەزارەتەش درا بە (ونستون چەرچل)، کە سیاسەتمەدارێکی نوێ و لێهاتووی بەریتانیا بوو، کۆمەڵێك پسپۆری لێهاتووی لە دەورووپشتی کۆکردەوە وەك مێجر نۆئیل (Majer Noel) و لۆرانسی عەرب (Lawrence of Arabia) و رۆبرت یۆنگ (R.Young)، هەوڵیاندا بەزووترین کات بەدانانی پلان بۆ دوو کۆنگرەی (لەندەن) و (قاهیرە) لەپێناو چارەسەری کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراست و رێکخستن و دیاریکردنی ئایندەیان[٢٧].

ئامانج لە کۆنگرەی لەندەن بۆ ئەوە بوو لەگەڵ تورکەکان (کەمالیستەکان) بگەنە رێککەوتن، کە لە ٢١ شوباتی ساڵی (١٩٢١) تاکو ١٤ ئاداری ساڵی (١٩٢١) خایاند، بەڵام ئەم کۆنگرەیە هەڵوەشایەوە و شکستی هێنا، ئەویش بە هۆی نارەزایی کەمالیستەکان بەرامبەر بە دوو کێشە، یەکەمیان نارەزایی بە ئامادەبوونی نوێنەری سوڵتان لە پاڵ نوێنەری کەمالیستەکان، دووەمیان رەتکردنەوەی داواکاری هاوپەیمانان بەوەی پەیمانی سیڤەر بکرێتە بنەمایەکی گفتوگۆکان، هەرچەندە گۆرانکاری لە هەڵوێستی بەریتانیا لە دۆزی کوردستان بەدیی دەکرا لەم کۆنگرەیەدا، بەڵام بەریتانییەکان سەرکەوتوو نەبوون بە رازی کردنی تورکەکان بۆ دانانی بناغەیەکی ئاشتی[٢٨]. ئەوەی شایەنی باس بێت لەو کاتەی تورکەکان لە کۆنگرەی لەندەن لە گفتوگۆدا بوون، سۆڤێتییەکان بەردەوام بوون لە گفتوگۆ لەگەڵ کەمالیستەکان، لە هەمان مانگدا گەیشتنە ئەنجامی مۆرکردنی رێککەوتنی دۆستایەتی و برایەتی لە ١٦ ئاداری ساڵی (١٩٢١)[٢٩].

کۆنگرەی قاهیرە، کە لە ماوەی (١٢)ی ئاداری ساڵی (١٩٢١) تاکو ٣٠ ئاداری ساڵی (١٩٢١) بەسترا، لە یەکەم رۆژی کۆنگرەدا چەرچل ئامانجەکانی بەستنی کۆنگرەی روونکردەوە، زۆر بابەت خرانە روو، بەڵام تارادەیەکی زۆر کۆنگرە تەرخانکرابوو بۆ مەسەلەی میزۆپۆتامیا و کێشەی کورد[٣٠]. گفتوگۆکان بەردەوام بوون دەربارەی هەڵبژاردنی سەرۆکی دەوڵەتی نوێی عێراق و پەیوەندی دارایی ئەم دەوڵەتە بە بەریتانیا. ئامادەکاری کرا بۆ پاراستنی و لە کۆتاییدا بەشداربووان رێککەوتن لەسەر دانانی فەیسەڵی کوری حوسێن لەسەر تەختی عێراق، بەو مەرجەی لەنێوان دانیشتووانی عێراقدا راپرسی بکرێت بۆی[٣١].

بەشداربووان لە کۆنگرەدا کێشەی کوردستانیان تاوتوێکرد وهەر لە رۆژی یەکەمی ئەم کۆنگرەیەدا (چەرچل) یادداشتێکی خستەروو، کە یادداشتی فەرمانگەی رۆژهەڵاتی ناوەراست بوو، دەربارەی ئایندەی کوردستان پێشکەش بە لیژنەی سیاسی کرا بۆ تاوتێکردن و خستنەرووی راو تێبینییەکان، ولە یادداشتەکەدا هاتبوو: "باوەری بەهێزمان ئەوەیە، کە ئەو ناوچە کوردییانەی زۆرینەی دانیشتووانی کوردن نابێت بخرێنە ناو ئەو دەوڵەتە عەرەبییەی کە پێك دەهێنرێت لە میزۆپۆتامیا..."[٣٢]. بەڵام لە رۆژی ١٥ ئادار، کە لیژنە کۆبوونەوە (سیر پیرسی کۆکس) وتەیەکی خستەروو دەربارەی ناوەرۆکی یادداشتی فەرمانگەی رۆژهەڵاتی ناوەراست دەڵێت: "کورد زۆرن لە دوو ناوچەی کەرکوك و سلێمانی و ناوچەکانی باکووری ویلایەتی موسڵدا، کە بەشێکە جیا نابێتەوە لە عێراق"[٣٣]. بەڵام (هربرت یۆنگ) رەخنەی لێگرت و پێشنیازی کرد بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بە زووترین کات و بە بێ هیچ دواکەوتنێك و بخرێتە ژێر سایەی (وصایە) راستەوخۆی مەندوبی سامی (High Commissoner) بەریتانیا لە عێراق دا، (ونستۆن چەرچل) بە باشی زانی، کە خودمختاریی تەواو بدرێت بە باشووری کوردستان کە زۆر سوودی دەبێت بە دروستکردنی دەوڵەتێکی جیاکەرەوە (عازل) لەنێوان فشارەکانی تورکیا لە (دەرەوە) و لەنێوان سەرهەڵدانی بزوتنەوەیەکی عێراقی دژایەتی بەریتانیا بکات لە (ناوەوە)، رەزامەندی دەربری ئەم پێشنیازە هەریەك لە (یۆنگ) و (مێجەر نۆئیل)، لە کۆتایی دا دەڵێن: "هیچ رێگایەك نییە بیگرینە بەر بۆ بەرژەوەندی بەریتانیا جگە لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی نوێی جیاکار (Buffer State) لەنێوان عێراق و تورکیادا"[٣٤].

لیژنە کۆتایی هێنا بە کۆبوونەوەکانی بە هەڵگری پێشنیازەکەی هەربرت یۆنگ (کە کوردستان بە شێوەیەکی

ڕاستەوخۆ لەلایەن مەندوبی سامییەوە بەڕێوەببردرێت و جیا لە عێراق بمێنێتەوە)، تەنها (پێرسی کۆکس) و (مس بیل) ڕازی نەبوون لەسەر ئەم بۆچوونە، کۆکس لە کۆتاییدا توانیوویەتی مەرجێك دابنێت، کە کار بەم پرۆژەیە ناکرێت تاکو سێ ساڵ بەسەریدا تێنەپەڕێت تا ئەو کاتەی ڕای گشتی کوردی باوەڕپێکراو کاریگەر دەردەکەوێت بۆ ئەوەی بڕیاری کۆتایی بدەن[٣٥].

لە ئەنجامی کۆنگرەی قاهیرەدا (ونستۆن چەرچڵ) ڕێکەوت لەسەر دانانی فەیسەڵ لەسەر تەختی عێراق، دانپێدانی بەریتانیا بە سەربەخۆیی دەوڵەتی عێراق، کە بەڵێن بدات بە هەڵوەشاندنەوەی ماندێتی لە بەرامبەردا پەیمانێکی هاوپەیمانی ببەستن، کە دەستەبەری مافەکانی لە گەشەسەندن و وەبەرهێنانی ئابووری عێراق بکات، بەم پێیەش شا فەیسەڵ بەرهەڵستییەکی توندی نواند دژ بە ماندێت لە دوای دامەزراندنی لەسەر تەختی عێراق، داوای کرد بە گۆڕینی بە پەیمانی هاوپەیمانێتی، هەر چەندە لە سەرەتادا ئەم داواکارییەی شا فەیسەڵ جێگای پێشوازیکردن دەبێت، بۆ ئەوەی بە ئەمریکا و کۆمەڵەی گەلان نیشان بدەن کە جێبەجێکردنی ماندێت لەسەر عێراق قوورسە، بەڵام لە کۆتاییدا وەزیری داگیرگاکان گەیشتە ئەو قەناعەتەی، کە بەریتانیا کۆتاییەك بە کێشەکانی نادۆزێتەوە لە ڕۆژهەڵات ئەگەر ئەمریکییەکان بەشداری نەبن لە نەوتی عێراقدا[٣٦]. هەر چۆنێك بێت سیاسەتی بەریتانیا بەرەو گۆڕان دەڕوات، کە زیاتر فشارەکانی ئەمریکای پێوە دیار بوو لەسەر کێشەی نەوتی ویلایەتی موسڵ، ئەوەتا لەو ساڵانەی دوای کۆنگرەی قاهیرەدا بەریتانیا پەیرەوی چەند سیاسەتێك دەکات:

١. کۆنترۆڵکردنی ئەو هەرێمانەی، ئەگەری بوونی نەوتییان هەیە، دەبێت لە ژێر چەتری سیاسەتی ماندێتدا قۆرخ بکرێن لەلایەن بەریتانیاوە.

٢. ئەگەر دەوڵەتێك لە زلهێزەکان خواستی بەشداربوونی هاووڵاتییانی هەبوو لەم بوارەدا، ئەوە بەریتانیا دەبێت ئاماژە بکات بۆ دەست هەڵگرتنی لە بەشێك لە بەرژەوەندییەکانی لە کۆمپانیای نەوتی تورکی بۆ مانەوەی پێگەی سەنتەری سیاسی، بەڵام بەهەرجۆرێك بێت ڕێگا لە گەڕان (تنقیب) یاخود بەرهەمهێنان بگیرێت، چونکە ناکۆکی لەسەرە تاکو چارەنوسی نێودەوڵەتی بەدیار دەکەوێت.

٣. پێدانی هەر ئیمتیازێکی نەوت لەم ناوچانەدا لەمەودوا دەبێت لەرێگای حکومەتی عێراق و پەرلەمانەکەیەوە بێت[٣٧].

بۆیە فەرمان بۆ (پێرسی کۆکس) (١٩٢٠-١٩٢٣) دەرچوو لە ٩ ئابی ساڵی (١٩٢١) بۆ ئەوەی داوا لە شا فەیسەڵ بکات، کار بکات بەپێی سیاسەتی ماندێت، لە کۆتاییدا وشەی ماندێت بخاتە ناو یاسای بنەڕەتی، لە ٢٠ ئاب داوا کرا بۆ شا فەیسەڵ ڕوون بکاتەوە، کە بەریتانیا دەیەوێت بە شێوەیەکی یاسایی ڕێکخراو دەربارەی بەڵێنەکانی بەپێی میساقی کۆمەڵەی گەلان کار بکات، بەشێوەیەکی تایبەت ڕێککەوتنامەی سان-ریمۆی نەوت، بۆی ڕوون بکرێتەوە، کە داوای کۆتایی هێنان بە ماندێت چەند ترسناکە لەسەر ئایندەی عێراق، چونکە ئەمریکا کۆسپ دەخاتە بەردەمی

لە ڕێگایی کۆمپانیا نەوتییەکان، بەریتانیا ڕووبەڕووی کۆسپی ترسناك دەبێتەوە لە ئەنجوومەنی (کۆمەڵەی گەلان)، ئەگەر ئەمریکاییەکان هاتنە پاڵ فەرەنسییەکانەوە لە دژی فەرمانی فەیسەڵ[٣٨] چەرچڵ داوای لە کۆکس کرد، کە بەڵێنی نووسراو لە شا فەیسەڵ وەربگرێت لەسەر پەیمانی بەریتانی-عێراقی، کە شێوەی کۆتاییەکەی بە شێوەیەك بێت بەریتانیا بتوانێت هەموو بەڵێنە نێودەوڵەتییەکانی جێبەجێ بکات و دەستەبەری یەکسانی بازرگانی لەگەڵ هەموو دەوڵەتە بیانییەکانی تێدا بێت، خشتەی ماندێتی بەریتانیا لە عێراقدا بە شێوەیەك دانرابێت، کە دەستەبەری بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا بکات، هەروەها دەبێت سیاسەتی (دەرگای کراوە) جێبەجێ بکات[٣٩].

حکومەتی بەریتانی دوای ئەوەی ناڕەزاییەکی زۆر بەدی کرد لەلایەن حکومەتی ئەمریکا بەپێی ئەو یادداشتانەی لەلایەن باڵیۆزی لە لەندەن پێشکەشی کردبوو، لە گرنگترین ئەو خاڵانەی تێدا، هاتبوو کە ئەمریکا گومانی هەیە ئەم ئیمتیازە لەلایەن حکومەتی نوێی عێراق ببەخشرێت بە کۆمپانیای نەوتی تورکی، بۆیە بەریتانیا بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە ئامۆژگاری دەدات بە حکومەتی عێراق بۆ دەرکردنی ڕاگەیاندنێك لەلایەن وەزارەتی بازرگانی عێراقەوە لە ٢٩ حوزەیرانی ساڵی (١٩٢١)، کە لە ڕۆژنامەی (الاوقات البصرية) و چەند ڕۆژنامەیەکی بەریتانی لە بەرواری تردا، کە داوای دەکرد لە هەموو ئەو لایەنانەی ئیمتیازیان پێبەخشراوە لەلایەن حکومەتی عوسمانی هەرچی بەڵگەیان بەدەستەوەیە پێشکەشی بکەن[٤٠] بۆیە کۆمپانیای نەوتی تورکی هەوڵیدا بۆ وەرگرتنی دانپێدانی حکومەتی عێراقی بۆ بەڵێنی عوسمانییەکان، بۆ ئەوەی شێوەیەکی یاسایی ببەخشێت بە داواکاری لەسەر ئیمتیازی نەوتی ویلایەتی موسڵ، لە ڕێگای (ئارنۆلد تی. ویلسون - A.T.Wilson)، کە بەڕێوەبەری کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ-فارسی بوو لە محەمەرە (١٩٢١-١٩٢٤) داواکاری پێشکەش کرد بە نوێنەرایەتی کۆمپانیای نەوتی تورکی لە ٢٨ کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٢)[٤١]. ئەم ڕاگەیاندنەی وەزارەتی بازرگانی عێراقی بە یەکەم ڕاگەیاندنی حکومەتی عێراقی نوێ هەژماردەکرێت لە خاوەندارێتی ناوچە نەوتییەکانی ویلایەتی موسڵ.

وەزارەتی داگیرگاکان لە ١١ شوباتی ساڵی (١٩٢٢) داوا لە (پێرسی کۆکس) مەندوبی سامی دەکات، فشار بخاتە سەر شا فەیسەڵ بۆ وەرگرتنی بەڵێنی بەخشینی ئیمتیاز بە کۆمپانیای نەوتی تورکی، بۆیە سیر پێرسی کۆکس یادداشتێك پێشکەش دەکات بە شا فەیسەڵ و داوای ڕەزامەندی دەکات لەسەر بەخشینی ئیمتیازی نەوتی موسڵ وبەغدا بە کۆمپانیای نەوتی تورکی، هەروەها ئەوەی خستەڕوو، کە داواکاری کۆمپانیاکە بەندە بەو ڕێککەوتنەی لەگەڵ حکومەتی عوسمانی لە ساڵی ١٩١٤ کراوە، پەیمانی سیڤەر بەپێی بەندی (٣١١) پارێزگاری کردووە لە هەمان ئیمتیازی کۆمپانیاکە، یادداشتەکە شا فەیسەڵی ئاگادار کردۆتەوە، کە پابەند بێت بە بەڵێنی عوسمانییەکانەوە، چونکە ئەگەر بە پێچەوانە کار بکات، ئەوا ئیمتیازی ئەم ناوچەیە دەگوازرێتەوە

بۆ بەردەم ناوبژیوانی نێودەوڵەتی، دەسەڵاتدارانی بەریتانی پێیان باشە حکومەتی عێراق رەزامەندبێت، چونکە حکومەتی بەریتانیا لە هەوڵی رێکخستنی بەرژەوندییەکانی بەریتانیا وفەرەنسا وئەمریکا دایە، هەروەها پێگەی عێراق پتەو دەکات، لەگەڵ ئەوەی حکومەتی عێراق دەتوانێت داوا لە کۆمپانیا بکات بۆ پێیدانی پشکێك لە بەرهەمی نەوتو قازانجو بەشێك لە پشکەکانی کۆمپانیا، دەشتوانێ وەبەرهێنانی خێرا لە ناوچەکەدا دەستەبەر بکاتو برێکی نەوتی هەرزان بۆ بەکارهێنانی ناوخۆیی دەستبکەوێت، هەروەها بەشداربوون لە بەرێوبردنی کۆمپانیا، لەگەڵ ئەوەی ئەم ئیمتیازە لە ناوچەیەکی دیاریکراو قەتیس بکرێت دوای گەرانو پشکنین[٤٢] . لە ئەنجامی گفتوگۆی زۆر لەنێوان (پێرسی کۆکس)و وەزیری دارایی عێراق (ساسۆن حسقێل)، شا فەیسەڵ بە پێرسی کۆکسی رادەگەیەنێت بە شێوەیەکی زارەکی کە عێراق دان دەنێت بە ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی بە مەرجێك حکومەتی بەریتانیا بەرژەوەندییەکانی عێراق دەستەبەربکات[٤٣] .

کۆکس تەنها بەم بەڵێنە زارەکییەی شا فەیسەڵ رازی نەبوو، بەڵکو هەوڵیدا بە وەرگرتنی بریارێك لە ئەنجوومەنی وەزیران لە رێگای ساسۆن حسقێل، کە بابەتەکە بخاتە بەردەم ئەنجوومەنی وەزیران بۆ ئەوەی رەزامەندی ئەنجوومەن وەربگرێت بۆ دەست پێ کردنەوەی گفتوگۆکان، بۆیە ساسۆن حسقێل نووسراوێك بە ژمارەی (٥٧٩) لە ١٧ کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٣) ئاراستەی سکرتێری ئەنجوومەنی وەزیران دەکات، پێیان رادەگەیەنێت، کە گرنگی وەبەرهێنانی کێڵگە نەوتەکان یەکێکە لەو بابەتە زیندووانەی کە لە روانگەی حکومەتەوە، پێشنیازی بکات، کە ئەنجوومەنی وەزیران داوا لە کۆکس بکات، کە بە حکومەتەکەی رابگەیەنێت ئەگەر کۆمپانیای نەوتی تورکی نەیتوانی بە زووترین کات داواکارییەکەی بچەسپێنێت، ئەوا حکومەتی عێراق خواستی هەیە، وەبەرهێنانی نەوتی موسڵو بەغدا بدا بە کۆمپانیایەك، کە لە ژێر چاودێری حکومەتی عێراق دابێت، کۆمپانیاکانی تر بۆ پرۆژەیەکی داشکانی ئاشکرا بانگهێشت بکرێت[٤٤] . لە ئەنجامی ئەم هەڵوێستەی حکومەتی عێراق مشتومرێکی زۆر دروست بوو لەنێوانی نوێنەرانی کۆمپانیاو حکومەتی عێراقی، بەڵام وەزارەتی داگیرگاکان ئەم جۆرە مشتومرەی پێ خۆش نەبوو لەسەر شەرعیەتی ئیمتیازی نەوتی ئەم ناوچانە، چونکە پێگەی لاواز دەکرد لە کۆمەڵەی گەلان لە کاتی گفتوگۆکانی کێشەی موسڵ لە کۆنگرەی لۆزاندا، بۆیە داوا دەکات لە مەندووبی سامی نوێی (هێنری دوبس ١٩٢٣ (Sir H.Dobbs–١٩٢٩) کۆتایی بێنێ بەم جۆرە رێورەسمانە[٤٥] .

*** نزیکبوونەوەی بەریتانیا لە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا:**

ئەو هەوڵانەی بەریتانیا لە ناوخۆی عێراق دەیدا تەنها بۆ ئەوەبوو، کە چارەسەرێك بدۆزێتەوە بۆ بەشداربوونی ئەمریکا لەپشکەکانی کۆمپانیای نەوتی تورکی، چونکە لە روانگەی وەزارەتی داگیرگاکانەوە کۆمپانیای ستاندرد (ئۆیل ئۆڤ نیۆجەرسی)و حکومەتی ئەمریکا هانی دانیشتووانی عێراقی دا بۆ ئەوەی شۆرشی ساڵی (١٩٢٠) بەرپابکەن لە دژی بەریتانییەکان، کە لەم هەوڵە سەرکەوتوو نەبوون، دەستیان دایە یارمەتیدانی تورکەکان بۆ ئەوەی ویلایەتی موسڵ بگەرێننەوە، ئەمانیش لەم رێگایەوە ئیمتیازی نەوتیان دەستکەوت لەم ناوچانەدا، وەزارەتی داگیرگاکان تەنها مەترسی لە ئەمریکا نەبوو، بەڵکو فەرەنسییەکانش ببوونە دێوەزمەی بەریتانیا، چونکە یارمەتی فەرەنسا بۆ تورکیا لە دژی یۆنان بەرامبەر وەرگرتنی ئیمتیازی نەوتی موسڵ بوو[٤٦] .

ئەو بارودۆخە باشەی هاتەکایەوە لە پەیوەندییەکانی فەرەنسا-تورکیا بەهۆی مۆرکردنی رێککەوتنامەی ئەنقەرە لە ٢٠ تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢١) بوو، کە حکومەتی بەریتانیاو شا فەیسەڵی تووشی دڵەراوکێ کرد، چونکە فەرەنسییەکان پێشنیازیان کرد بۆ تورکەکان، ویلایەتی موسڵ داگیر بکەنەوە لەپێناو وەرگرتنو دەستکەوتنی ئیمتیازی نەوت[٤٧] .

بەریتانییەکان گەیشتبوونە قەناعەتێك، ئەگەر رێگا بدەن بە کۆمپانیاکانی ئەمریکا بۆ پێشخستنی رەوتی نەوتی هەردوو ویلایەتی موسڵ وبەغدا ئەوە کێشەی هەمیشەیی دروستدەکرد. لەمەش خراپتر، گرژی بەردەوامی لە پەیوەندیی نێوان ئەمریکاو بەریتانیا دروستدەکرد، بەڵام بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر بەشداریکردنی راستەوخۆی ئەمریکا لە پەرەپێدانی سەرچاوەکانی نەوتی هەردوو ویلایەت بە ئیمتیازێکی بەرچاوتری بەریتانیا بوو، چونکە حکومەتی لەندەن دەیویست ئەم پەرەپێدانەی مەیدانەکانی نەوتی موسڵو بەغدا زۆر خێراتر ئەنجام بدرێت[٤٨] . کاربەدەستانی بەریتانیا پێیان باش بوو داهاتی پێویست بۆ حکومەتی دورستکراوی خۆیان لە ناوچەکەدا دابینبکەنو ئەوەندی دەکرێت بۆ دابینکردنی خەرجییەکانی ئەم دەوڵەتە تازە دروستکراوەی میزۆپۆتامیا، بۆ ئەوەی گوشار نەخرێتە سەر دارایی بەریتانیا[٤٩] . ئەوەتا لە ناوەندی سیاسی بەریتانیش دەنگوباس هەبوو بەوەی باشترین رێگا چارەسەر بۆ ئەو کێشانەی هەن لەسەر نەوتی رۆژهەڵاتی ناوەراستو میزۆپۆتامیا نزیك بوونەوە لە گەڵ ئەمریکاو بەرژەوەندی ئابووری بەریتانیای تێدایە، ئەوەتا لە کاتێکی نزیك داو لە ٣ تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٠)دا هەریەك لە (تیلی J.Tilley)و (ئەرنست ویکلیEarnest Weakley)، کە لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا بەرپرس بوون، رێکەوتبوون لەسەر ئەوەی کە بەشداربوونی کۆمپانیای (ستاندرد ئۆیل ئۆڤ نیۆجەرسی) زۆر پێویستە بەنسبەت بەریتانیا، لە رووی ئابوورییەوە سوود دەبەخشێت بە حکومەتی عێراق، (ویکلی) ئاماژەی کرد بەوەی کۆمپانیای نەوتی تورکی دەتوانێت پەرەپێدانی فراوان بکات لە کێڵگە نەوتییەکانی هەردوو ویلایەتی موسڵ وبەغدا، دەتوانرێت کۆمپانیای (ستاندرد ئۆیل ئۆڤ نیوجەرسی) ئەمریکی بانگهێشت بکرێت[٥٠] . (جۆن کادمان) لە ئیدارەی گشتی پترۆلی بەریتانیا بە پێشنیازەکە رازی بوو، پێشنیازی کرد بەوەی کۆمپانیای نەوتی تورکی

تەنها ناوچەیەك دەستنیشان نەكات بۆ كاركردن، بەڵكو چەندین ناوچەی جیاواز هەڵبژێرێت وبیخاتە بەردەم كۆمپانیاكانی تر لەسەر بناغەی سیاسەتی(دەرگای كراوە)[٥١].

گومانی تێدا نەبوو، كە سەرمایەو تەكنەلۆژیای ئەمریكا چالاكانە رەوتەكەی خێراتر دەكرد، بۆیە سەر ئەنجام بۆچوونەكانی كۆمپانیای (شێل) هاتەدی، كە ئەیوت بەشداریكردنی ئەمەریكییەكان دەستی كۆمپانیا نەوتییەكانی لە رووبەڕووبوونەوەی گرفتە سیاسییەكانە، كە لەوانەبوو لەم بەشە نائارامەی جیهاندا رووبدا، بەهێزتر ئەكا[٥٢].

لەم كاتەشدا (گالۆست گوڵبەنكیان)یش دەنگی خۆی خستەپاڵ ئەم جۆرە بیركردنەوە نوێیانەو ئامۆژگاریی یارمەتیدەری بەردەوامی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیای كرد. كە لە جیاتی ئەوەی ئەمریكا لە سنووری ئیمتیازی میزۆپۆتامیا (لەدەرەوە) بهێڵێتەوە، ئەمریكاییەكان بۆ ناوەوە) بانگهێشت بكا و رێ لە دژایەتی كردنی ئەو ئیمتیازە بومستێنێت، لە ئەنجامدا یارمەتیدەری هەمیشەیی وەزارەتی دەرەوەی لە ژێر كاریگەری ئەم ئامۆژگارییەی گوڵبەنكیان دا. چالاكانە فەرمانی بە كۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ-فارسی و كۆمپانیای (رۆیاڵ دۆچ-شێڵدا)، كە بەرژەوەندیی سیاسەتی بەریتانیا لەوەدایە، كە بوار بە ئەمریكاییەكان بدرێت و ئەم كارە پێوستە هەرچی زووترە ئەنجام بدرێت، پاشان نامەیەكی بۆ كۆڵبەنگیان نووسی وداوای لێكرد وەك فاكتەرێك هەرچییەكی بۆ دەكرێت بۆ راكێشانی پێی ئەمریكاییەكان بۆ ناوچەی میزۆپۆتامیا دریغی نەكات[٥٣]. مەبەست لە راكێشانی ئەمریكا بۆ ناوچەكانی میزۆپۆتامیا هەمیشە لەوەدایە، كە بەشداری بكات لە پەرەپێدانی نەوتی ناوچەكەدا لە رێگای بەشداری كردنیان لە كۆمپانیای نەوتی توركی، چونكە لە ناوچەی ئیمتیازی ئەم كۆمپانیایەدا بوو.

ئەم گۆرانە ١٨٠ پلەیە لە هەڵوێستی بەریتانیا رەووشتێكی ئاشتیخوازانەی گرتە بەرو چرای سەوزی بۆ كۆمپانیا نەوتییەكانی ئەمریكا لە میزۆپۆتامیا داگیرسان، بە تایبەت لە دوای ساڵی ١٩٢١، كە ئیدارەی ئەمریكی نوێ (وارین هاردینگ) [٥٤] لە ئەمریكای نوێ هاتە سەرتەخت. هیربرت هۆڤەریش (Herbert Hoover) وەزیری بازرگانی ئەمریكا پێشنیازی ئەوەی كرد، كە بۆ دەستپێكردنی چالاكی لە میزۆپۆتامیا، ژمارەیەك سەندیكای پێكهاتوو لەسەرجەم كۆمپانیا نەوتییەكانی ئەمریكا، پێك بهێنرێت، چونكە بە تەنها یەك كۆمپانیا ناتوانێت پشتیووانی حكومەتی ئەمریكا بۆ خۆی مسۆگەر بكات، هەروەها جڵەوی ئەم ململانێیە بگرێتە ئەستۆی خۆی لەگەڵ كۆمپانیاكانی جیهاندا. (وۆلتەر تێگل) بەرێوبەری ستاندرد نیوجەرسی بۆ ئەم مەبەستە (كۆنسۆرتیوم-Consortium)ی تایبەتی لە كۆمپانیا گرنگەكانی نەوتی ئەمریكا پێكهێنا، هەرچەندە لەرابوورودا ئەم جۆرە كۆكردنەوەی كۆمپانیا ئەمریكاییەكان تۆمەتبار دەكران بە قۆرخكردنی نەوتی جیهان، بەڵام بارودۆخی ئەم كاتە گۆرابوو تەنانەت لە ناوخۆی ناوەندی ئەمریكا جۆرە كۆبونەوەیەك بە پاڵەوانێتی نەتەوەیی سەیر دەكرا، كە سیاسەتی (دەرگای كراوە)ی بۆ بەدەستهێنانی نەوت لە دەرەوەی وڵات بۆ ئەمریكا جێبەجێ دەكرد[٥٥]. ئەم كۆبوونەوەی كۆمپانیاكانی نەوتی ئەمریكا لە (٣)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (١٩٢١) راگەیاندرا، كە حەوت كۆمپانیای زەبەلاحی نەوتی بەشدارییان تێدا كردو لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢١) داواكاریان دا بە وەزیری دەرەوە ئەمریكا بۆ ئەوەی ئامادە باشی بكات بۆ ئەم كۆمەڵەیە بۆ ناردنی شاندێكی تر لە ئەندازیاران و پسپۆرانی جیۆلۆجی بۆ ئەوەی دەست بكەن بە رووپێوكردن لەسەر زەوی میزۆپۆتامیا[٥٦] بەڵام وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكا هەوڵیدا لە رێگایی فشاری زیاترەوە داواكاری كۆنسۆرتیۆم كۆمپانیاكانی ئەمریكا جێبەجێ بكات، ئەمەش لەو یادداشتە روونبەدەبێتەوە كە باڵیۆزی ئەمریكا لە (١٧)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢١) لە لەندەن پێشكەشی كردبوو بە حكومەتی بەریتانیا، كە لە ناوەرۆكیدا هاتبوو، ئەمریكا بە هیچ جۆرێك دان نانێت بە شەرعیەتی ئیمتیازی كۆمپانیای نەوتی توركی، هەروەها داوا دەكات بە خستنەرووی ئەم ئیمتیازە بۆ بەردەم ناوبژیوانی نێودەوڵەتی[٥٧].

هەر دوا بەدوای ئەم هەڵوێستەی ئەمریكا، بەریتانییەكان زۆر نیگەران دەكات، لە ئیمتیازی كۆمپانیای نەوتی توركی، دەیانخاتە گومانەوەو شەپرزەیان دەكات بە چۆنییەتی چارەسەركردنی ئەم گرفتە، لە راپۆرتێكی نهێنی وەزارەتی داگیرگاكانی بەریتانیا دا هاتووە: "بەردەوام حكومەتی بەریتانیای مەزن دەنگۆی ئەوە دەكات، كە مافی بەخشینی ئیمتیازی نەوتی دراوە بە كۆمپانیای نەوتی توركی لە هەردوو ویلایەتی باكووری عێراقدا لەلایەن سەدری ئەعزەمی عوسمانی، حكومەتی خاوەن شكۆ هەستی بە لاوازی ئەم داواكارییەی كۆمپانیای نەوتی توركی كردووە، لەو كاتەی ئەمریكا لە ساڵی (١٩٢١) تانە لە راستیو دروستی بەڵگەی كۆمپانیای نەوتی توركی داو فشاری كردووە بۆ گواستنەوەی ئەم كێشەیە بۆ ناوبژیوانی سەربەخۆیی دادگایی، بەڵام حكومەتی خاوەن شكۆ هیچ ئەم رێگایەی پێخۆش نەبوو بۆ چارەسەركردنی ئەم كێشەیە، لە لایەكی تر هەستی كردبوو بەوەی ناشێت بەریتانیا بەردەوام بێت لە رەتكردنەوەی داواكاری بەرووی ناوبژیوان، ئەگەر حكومەتی ئەمریكا بەردەوام بێت لەپێناو ئەم چارەسەركردنەدا"[٥٨].

كۆتایی ساڵی ١٩٢١ (جۆن كادمان)، كە بەرپرسی كۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ-فارسی بوو، لە ژێر پەردەی كۆنگرەی واشنتۆن بە بیانووی گەشتێكی زانستی بۆ دامو دەزگا پترۆڵییەكانی ئەمریكا گەشتێك دەكات بۆ ئەمریكا، بەڵام لە راستیدا راسپێرابوو بە دروستكردنی ئاشتی لەگەڵ كۆمپانیا نەوتییەكانی ئەمریكا و راكێشانیان بۆ بەشداربوون لە كۆمپانیای نەوتی توركی دا، هەروەها بۆ پەرەپێدانی نەوتی میزۆپۆتامیا، مەبەستی (جۆن كادمان) لەو وتارەی خستیە روو لە پەیمانگای ئەمریكی بۆ پترۆڵ (American Petroleum Institute) بەدەردەكەوێت، كە دەڵێت: "ئەو سەرمایە بیانییانەی پێویستە بۆ پەرەپێدان و گەشەسەندنی

سامانی پترۆل لە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا بە چاوێکی پربایەخ سەیر دەکرێن"، ئەمیش ئاماژەیەکە بەوەی بەریتانیا خواستویەتی سیاسەتی (دەرگای کراوە) پەیرەو بکات[٥٩].

(جۆن کادمان) بەردەوام بوو لە هەوڵەکانی، تاکو ساڵی (١٩٢٢)، کە کار بکاتە سەر ناوەندی سیاسیی بەریتانیا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ستراتیژی کێشەی نەوت چارەسەر بکات لەنێوان بەریتانیا-ئەمریکا، بەتایبەتی لەو بۆچوونەی خستبویەروو لە لێکدانی (اندماج) هەردوو بەرژەوەندییەکان، یاخود بەشداربوونی کۆنسۆرتیۆم کۆمپانیاکانی ئەمریکا دەبێتە گەورەترین پشك لە بەشداربوونی کۆمپانیای نەوتی تورکی و سوودێکی گەورە پێشکەش دەکات هەم لە رووی سەرمایەدا هەم لە رووی ئەزموونی کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەمریکا، کە هەیانبوو لە بواری پیشەسازی نەوتدا[٦٠].

ئەم هەنگاوانەی بەریتانیا تەنها لەپێناو ئەوە بوو، بە ئەمریکا راگەیەنێت، کە نییەتی پاکە بەرامبەری. لەو هەنگاوە بەرچاوانەی کە بۆ ئەو مەبەستەش نابووی، لە هەڵوەشاندنەوەی هاوپەیمانیەتی ئەنگلۆ-ژاپۆنی بوو لە بواری دەریایی، کە ئەمریکا بە هەرەشەی دەزانی لەسەر بەرژەوەندییەکانی، دووەم هەنگاو بەشداریکردنی بەریتانیا بوو لە کۆنگرەی واشنتۆن لە ساڵانی (١٩٢١-١٩٢٢) وەك خۆنواندنی رۆحی رێککەوتنی ئەنگلۆ-ئەمریکی، جگە لە وتەکانی پرۆفیسۆر (جۆن کادمان)، (ونستۆن چەرچڵ)یش هەوڵی ئاگادارکردنەوەی ناوەندی سیاسیی بەریتانیا دەدا بەوەی هیچ قۆرخکردنێك نەکرێت لەدژی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا، چونکە کاردەکاتە سەر بەهێزکردنی هاورێیەتی ئەمریکا، بە پێچەوانەش چەرچڵ داوای هەوڵی زیاتر دەکات بۆ بەهێزکردنی هاورێیەتی ئەمریکا، چونکە بە باوەری ئەو پاڵپشتی ئەمریکا زۆر گرنگە بۆ ئاسایشی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا[٦١].

دوای هەڵوێستی ئەمریکا لە (١٧)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢١) دەربارەی گواستنەوەی شەرعیەتی ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی بۆ بەردەم ناوبژیوانی نێودەوڵەتی، بەریتانیا ناچار بوو بەدوای چارەسەرێکی کۆتایی بدۆزێتەوە بۆ ئەمریکا لە کانە نەوتەکانی ویلایەتی موسڵ دا، چونکە بە قەناعەتی بەریتانیا، ئەمریکا ئەگەر بەشدار نەکرێت لەم نەوتەدا بە هیچ شێوەیەك واز لە داواکاری و دژایەتی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا ناهێنێت لەم ناوچەیەدا، بۆیە بەرامبەر بە حکومەتی بەریتانیا سێ پێشنیاز هەبوو بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە:

١. دەست لە ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی هەڵگرێت، کە نەوتی ولایەتی موسڵ وبەغدا پێی بەخشرابوو.

٢. ئەم کێشەیە بخرێتە بەردەم ناوبژیوانی نێودەوڵەتی، کە خواستی ئەمریکا بوو.

٣. بەکارهێنانی چەند شێوازێك بۆ ئەوەی حکومەتی ئەمریکا دان بە شەرعیەتی ئیمتیاز بنێت.

ئەم پێشنیازانە خرانە بەردەم گفتوگۆ لە کۆبونەوەیەکی نا فەرمی، کە لە وەزارەتی داگیرگاکان لە ١٦ تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٢) کە بە سەرۆکایەتی (جۆن شکبرە-J. Shuckburgh) بەسترا، کە یاریدەری وەزیری داگیرگاکان بۆ کاروباری رۆژهەڵاتی ناوەراست بوو، لەنێوان ساڵانی (١٩٢١-١٩٣١)، هەروەها بە بەشداری نوێنەری وەزارەتی دەرەوەو فەرمانگای نەوت، تیایدا بریاریان دا بە دوورخستنەوەی پێشنیازی ناوبژیوانی نێودەوڵەتی و رەزامەندیان دەربری لەسەر ئەوەی کە کۆمپانیای نەوتی تورکی بدرێتە ئەمریکییەکان، گفتوگۆش لەگەڵ کۆمپانیای (ستاندارد ئۆیل) لەسەر بناغەی بازرگانی دەستپێبکات[٦٢].

لە راستیدا حکومەتی بەریتانیا ئامۆژگاری کرابوو بەوەی تاکە رێگا بۆ چارەسەرکردنی ئەم بەرهەڵستییەی ئەمریکا دەربارەی داواکارییەکەی کۆمپانیای نەوتی تورکی، هەوڵ بدات بەوەی جارێکی تر کۆمپانیا رێکبخرێتەوە لەپێناو بەشداریکردنی سەرمایەی ئەمریکی، هەروەها نابێت ئەم کارە راستەوخۆ لەلایەن حکومەتی بەریتانیا ئەنجامبدرێت[٦٣].

وەزیری داگیرگاکان (چەرچڵ) لە سەر ئەم پێشنیازە، بۆ دەسەڵات پێدانی (جۆن کادمان) راوێژکاری کۆمپانیای نەوتی (ئەنگلۆ-فارسی)، تا بچێتە ناو گفتوگۆی سەرەتایی لەگەڵ کۆمپانیای (ستاندرد ئۆیل ئوۆ نیوجەرسی) دەربارەی بەشداربوونی بەرژەوەندیی ئەمریکا لە کۆمپانیای نەوتی تورکی رازی بوو، بەڵام دابەشکردنی پشکەکان دەبێت لە کۆنگرەی لەندەنەوە بکرێت و بە بەشداربوونی هەریەك لە هۆڵەندییەکان و فەرەنسییەکان، چونکە پشکیان هەبوو لە هەمان کۆمپانیادا[٦٤].

لە (٨)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٢٢) (چارلس گرینووی-Greenway)، کە بەرێوەبەر بوو لە کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ-فارسی بە (بێدفۆرد-A.C.Bedford) لەکۆمپانیای ستاندارد نیوجەرسی رادەگەیەنێت کە بە زووترین کات نوێنەر بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی تورکی بنێرێت[٦٥].

لەو کاتەدا، کە ئەم پێشنیازە خرایە بەردەم وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، وەزارەت بە چاوێکی گەشبینیەوە سەیری کردو پێشنیازی کرد، کە رێگا لە چانسی بەشداربوونی کۆمپانیاکانی ئەمریکی لەم جۆرە ئیمتیازەدا نەگیرێت، بۆیە هیچ رەخنەیەکی نەبوو لە پەرەپێدانی کێڵگە نەوتییەکانی میزۆپۆتامیا لە رێگای کۆمپانیای نەوتی تورکی، بە مەرجێك بەخشینی شەرعیەتی ئەم ئیمتیازە نوێیە لە رێگای حکومەتی عێراقەوە بێت، هەروەها هەمان حکومەت دان بەم ئیمتیازە بنێت، کە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە پێیبەخشراوە[٦٦].

لە (٢٦)ی حوزیرانی هەمان ساڵ (بیدفۆرد) وەڵامی نامەکەی گرینەوەی دایەوە، کە رەزامەندی وەزارەتی دەرەوەی وەرگرتووە بۆ گفتوگۆکردن، بە مەرجێك لەسەر بنەمای (دەرگای کراوە) بێت و هیچ دانێك بەشەرعیەتی ئیمتیاز نانرێت، تاکو چارەسەری یەکسان بۆ کێشەکان نەکرێت و هەر رێککەوتنێك ئەنجام بدرێت دەبێت لەلایەن وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاوە پەسەند بکرێت[٦٧].

لە مانگی تەمموزی ساڵی (١٩٢٢) گفتوگۆ لەنێوان نوێنەرانی کۆمپانیای نەوتی تورکی و نوێنەرانی گرووپی کۆمپانیاکانی ئەمریکی لە لەندەن دەستی پێکرد بۆ

بەشداریکردن لە پەرەپێدانی نەوتی ویلایەتی موسڵ وبەغدا[٦٨] . بەشداربووان لە گفتوگۆکان دوو گرووپ بوون، کە (والتەر تیگل-[٦٩] (Walter Teagle) نوێنەرایەتی سەرجەم کۆمپانیا ناو کۆنسۆرتیۆمی[٧٠] ئەمریکی دەکرد لەلایەك، لە لایەکی تر گرووپی دووەم پێکهاتبوون لە هەریەك لە (هێنری دیتردینگ) (کۆمپانیای نەوتی رۆیال دۆچ-شێڵ) و (چارلس گرینوەی) (کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ-فارسی)و (کۆلۆنێل ئەرنست مرسیە) (Colonel Ernest Mercier) (کۆمپانیای نەوتی فەرەنسیC.E.P)، هەروەها لە ناو ئامادەبووانیدا کەسی دیاری بواری نەوتی وەك کالۆست گولبەنکیان هەبوو، کە لە هەمووان هەستیار تر رۆڵی دەبینی، سەرجەم نەیارانی والتەر تیگل لە کۆمپانیای نەوتی تورکیدا هاوبەشبوون و ئیمتیازی نەوتی (ویلایەتی موسڵ) یان لە دەستدابوو[٧١] .

چەندین خاڵ لە ناو گفتوگۆکانی نێوان گرووپی کۆمپانیای نەوتی تورکی گرووپی کۆمپانیا ئەمریکی هەبوون، کە خاڵی ناکۆکی بوون، لە گرنگترینیان شەرعیەتی ئیمتیازی نەوتی کۆمپانیای نەوتی تورکی بوو، دابەشکردنی پشکەکانی کۆمپانیا لەنێوان بەشداربووان، یەکەم کێشە وادیار بوو، کە هەمووان رەزامەندبوون لەسەری ئەوەی دەبێت حکومەتی عێراق جارێکی تر شەرعیەتی بدات بە ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی لەسەر کێڵگە نەوتییەکانی ویلایەتی موسڵ و بەغدا. بۆ چارەسەرکردنی کێشەی پشکەکان لە کۆمپانیادا پێشنیازێك هەبوو، کە بۆ ئەوەی جارێکی تر رێککەوتنامەی سان-ریمۆ هەمواربکرێتەوە خرابووەروو، داوای ئەو پشکانەی دەکرد، کە بۆ حکومەتی عێراق تەرخان کرابوو بەرامبەر پێشنیازی پێدانی برێکی پارە بۆ هەموو تەنێك لە نەوت بەرهەمبهێنرێت بدرێ بە حکومەتی عێراقی، یەکەم پێشنیاز خرایە روو بۆ پشکی بەشداربوونی ئەمریکییەکان بە رێژەی ١٢٪، بەڵام ئەمریکییەکان رازی نەبوون بەم پشکە، چونکە داوای یەکسانیان دەکرد لە پشکەکان[٧٢] .

لە (٢٦)ی تەمموزی ساڵی (١٩٢٢) جارێکی تر گفتوگۆکان دەست پێکرانەوە لەنێوان هەردوو گرووپ، کە پێشنیازێکی نوێی هاتەکایەوە، ئەویش پێکهاتبوو لەوەی کۆمپانیای نەوتی تورکی ژمارەیەك لە پارچە زەوی نەوتی هەڵبژێرێت، کە لە ناو سنووری ئیمتیازدا بن، ئەو پارچانەی تر کە دەمێننەوە بخرێنە روو بۆ (موزایەدە)ی ئاشکرا بۆ هەموو بەشداربووان، رێککەوتن لەسەر ئەوەی پشکەکانی حکومەتی عێراق هەڵوەشێتەوە بەرامبەر بەپێدانی برێکی پارە[٧٣] . بەڵام بەهۆی دابەشکردنی پشکەکانی کۆمپانیاکە، کە گرووپی ئەمریکی رێژەی ١٢٪ رەتکردەوە، هەرچەندە رێژەکەی بۆ ٢٠٪ زیادکرا، بەڵام پێداگرتنی گرووپی ئەمریکا لەسەر پشکی یەکسانی، بەشداربووان نەگەیشتنە رێککەوتنێکی کۆتایی و گفتوگۆکان وەستان[٧٤] چونکە گۆرانکاری ستراتیژی و سیاسی لە ناوچەکەدا هاتەکایەوە، بەتایبەتی دوای سەرهەڵدانی بزوتنەوەی کەمالستی، کە سەرکەوتنی بەرچاوی بەسەر هێزەکانی یۆنانی بە دەستهێنابوو، وەك دەسەڵاتێکی نوێی خاوەن پاشماوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی خۆی چەسپاند لە ناوچەکەدا. داوای گۆرینی یاخود چاکردنی ئەو گۆرانکارییانەی لە ناوچەکەدا کرابوو بە هۆی پەیمانی سیڤەرەوە، ئەم بارودۆخە نوێیە کاریگەری هەبوو لەسەر گۆرینی سیاسەتی وڵاتە زلهێزەکان بەرامبەر بە تورکیا، بەتایبەتی لەنێوان تورکیا و هەر یەك لە فەرەنسا و یەکێتی سۆڤیەت و ئیتالیا و ئەمریکا، لە ئەنجامدا بەشێکی زۆر لە زلهێزەکان لە پەیمانی سیڤەر پاشگەز بوونەوە، ئەم بارودۆخە بەریتانیای ناچار کرد، کە بەرژەوەندییەکانی بپارێزێت و بریاریدا، کە پەیمانی سیڤەر هەڵوەشێتەوە کار بۆ پەیمانێکی نوێ بکرێت بە ناوی (لۆزان) بۆ ئەوەی رێگایەکی ئاشتی بدۆزێتەوە لەنێوان تورکیا و زلهێزەکاندا[٧٥].

*** کۆنگرەی لۆزان (٢٠/١١/١٩٢٢-٢٤/٧/١٩٢٣)و پرسی نەوتی باشووری کوردستان:**

لە٢٠ تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٢) دەست کرا بە کۆبونەوەکانی کۆنگرەی (لۆزان) بۆ باسکردن و لێکۆڵینەوە لەسەر کێشەکانی نێوان تورکیا و یۆنان، هەروەها بۆ بەستنی پەیمانی ئاشتی نوێ لەنێوان زلهێزەکان و تورکیا لەلایەك، کە جێگای پەیمانی سیڤەر(١٠ئاب١٩٢٠) بگرێتەوە، چونکە کەمالیستەکان ئەم رێککەوتنەیان رەتکردەوە، کێشەی ویلایەتی موسڵ یەکێك بوو لەو کێشە گرنگانەی، دەبوایە کۆنگرە چارەسەرێکی گونجاوی بۆ بدۆزیایەتەوە لەنێوان سنوورەکانی تورکیا و عێراقدا[٧٦] . ئەو دەوڵەتانەی ئامادەبوون لە کۆنگرەدا بەدوای رێگای ئاشتی دەگەران، چونکە بەتەمانەبوون ئامانجەکانیان جێبەجێ بکەن لە بە کارهێنانی هێزدا، ئەمە جگە لەوەی نەوت ئامانجێکی تر بوو لە خواستەکانیان، کارتی نەوت رۆڵیکی یەك لاکەرەوەی بینی لە هەڵوەشاندنەوەی ئەو پلان و پرۆژانەی چارەنووسی گەلانی کورد و ئەرمن و یۆنانی پێ دیاری کرابوو لە رابردوویەکی نزیکدا، بەتایبەت لە دوای ئەوەی ئەمریکا لە رۆژی چوارەم بەشداری ئەم کۆنگرەیە دەکات[٧٧] . یەکێك لەو کێشە نەوتییانەی رووبەرووی کۆنگرەی (لۆزان) بووە هەر لە رۆژانی سەرەتادا، بەشداریکردنی کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەمریکا بوو لە پەرەپێدانی نەوتی رۆژهەڵات و ویلایەتی موسڵ بەتایبەتی، جەخت کردنەوەی لایەنی بەریتانیا بۆ دەستەبەرکردنی داواکارییەکانی کۆمپانیای نەوتی تورکی لەسەر ئەو ئیمتیازەی لە ساڵی (١٩١٤) لەلایەن حکومەتی عوسمانییەوە پێدرابوو[٧٨] .

هەرچەندە کێشەی هەرێمی ویلایەتی موسڵ لەنێوان تورکیا و بەریتانیا کێشەیەکی هەمیشەییە، کێشەی نەوتی ئەم ناوچەیە و ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی کێشەی دووەم بوو لەنێوان زلهێزەکان، ئەم دوو کێشەیە وای لێهاتبوو، کە نەدەکرا باس لە هەریەك لەم دوو کێشەیە بە جودا بکرێت، ئەوەی لە کۆنگرەی (لۆزان) بە دیار کەوت، ئەوەبوو کە گرنگی زیاتر بە کێشەی نەوت دەدرا لەنێوان زلهێزەکان بۆ یەك لاکردنەوەی پشکی بەرژەوەندییەکانیان لەم ناوچەیەدا[٧٩] .



دواخستنی ڕێککەوتنی نێوان کۆمپانیای نەوتی تورکی و گرووپی کۆمپانیاکانی ئەمریکا لە پێش ئەم کۆنگرەیەدا، تەنها ئەوە دەسەلمێنێت، کە بەریتانیا دەیویست ویلایەتی موسڵ لە ناو چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقی نوێدا بهێڵێتەوە، چونکە کۆنترۆڵ لەسەر کێڵگە نەوتییەکان ئاسان تر دەبێت لەوەی بخرێنە پاڵ تورکیا، ئەم بۆچوونەی بەریتانیا زیاتر لەو نامەیە ئاشکرا دەبێت، کە بە ناوی (کێڵگە نەوتییەکانی ولایەتی موسڵ)، لەلایەن وەزارەتی دەریایی بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا لە (٧)ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٢٢) بە ژمارەی (٦٠٧٩٢/٢٧/٧٣٠) ئاراستە کرابوو، وا دەردەکەوێت دوای چەند ڕۆژێك لە بەستنی کۆبونەوەکانی (لۆزان) ئاراستە کرابێت، لە ناوەڕۆکیدا هاتووە: "کێشەی سەرەکی لە ڕوانگەی ستراتیژیەوە ئەوەیە، کە بەریتانیا ئەو ناوچانە کۆنترۆڵ بکا، کە کێڵگە نەوتییەکانی لێیە، ...ئەگەر هاتوو ئەم بۆچوونە دەستەبەرکرا، ئەوا دامەزراندنی کۆمپانیا یاخود کۆمپانیاکان، کە بۆ وەبەرهێنانی ئیمتیازی نەوت زۆر گرنگی نییە"[٨٠].

بۆ ئەم مەبەستەش بەریتانییەکان خۆیان باش ئامادەکردبوو و چەندین پلان و پێشنیازیان داڕشتبوو، تەنها بۆ ئەوەی لایەنە بەشداربووەکانی کۆنگرە بۆ لای بەرژەوەندییەکانی خۆیان ڕابکێشن. بۆ چارسەرکردنی هەردوو کێشە سەرەکییەکانی (نەوت و سنوورەکانی ویلایەتی موسڵ) سەرۆکی شاندی بەریتانیا لەم کۆنگرەیەدا، وەزیری دەرەوە بوو (لۆرد کرزن)، کە باشترین ڕێگای بۆ خواستەکانی ئیتاڵیا ئامادەکردبوو، لە (١٦)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٢٢) (کرزن) ڕایگەیاند، دوای یەکلایی کردنەوەی کێشەی موسڵ، ئیتاڵیا لە سوودو بەرژەوەندییە نەوتییەکانی ئەو ناوچانە بەشداربکرێت، بە تایبەتی گووتبووی: "پشکێك لە نەوتی موسڵی" بدرێتی[٨١]. تەنانەت سەرچاوەیەك ئاماژە بەوە دەکات، سەرۆکی وەزیرانی ئیتاڵیا (بنیتۆ مۆسۆلینی) داوای کردبوو مافی ئیتاڵیا مسۆگەر بکرێت لە بەشداری نەوتی کوردستان[٨٢]، بەریتانیا ئەم پێشنیازەی خستەڕوو، تا ئیتاڵییەکان لە کۆنگرە پاڵپشتی بکەن، بۆ ئەوەی پێگەی بەریتانیا بەهێز بکرێت، کە پەیرەوەی سیاسەتی (دەرگای کراوە) دەکات[٨٣]. هەمان بەڵێن درابوو بە تورکیا بەرامبەر بە دەست هەڵگرتنی لەسەر ویلایەتی موسڵ[٨٤]، لەلایەکی تر دەبوایە بەریتانییەکان حکومەتی ئەمریکا ڕازی بکەن، کە پشکەکانی زیاد بکرێت بۆ ٢٤٪ لە کۆمپانیای نەوتی تورکی بە مەرجێك ئەمریکا دانبنێت بە شەرعیەتی ئیمتیازی (TPC)، هەروەها داوای لە شاندی ئەمریکی کرد لە (لۆزان)، کە بەشێوەی چاودێر هاتبوون، پشتیووانی لە هەڵوێستی بەریتانیا بکەن، بەڵام وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا خۆی بە دوور ڕاگرت لەوەی هیچ بەڵێنێك بدات، لەوەش زیاتر جارێکی تر داواکاری خۆی دووپاتکردەوە لە سەر ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی، کە دەبێت لەلایەن حکومەتی عێراقەوە ببەخشرێت[٨٥]. لە لایەکی تر حکومەتی بەریتانی دەستیکرد بە جێبەجێکردنی ئەو خاڵانەی کە لە پێش کۆنگرەدا هەردوو گرووپی کۆمپانیای نەوتی تورکی و گرووپی ئەمریکی لە گفتوگۆکانی لەندەن گەیشتبوونە ڕێککەوتنی چەند خاڵێك لە ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی، ئەو خاڵەی کە هەمووان هاودەنگ بوون لەسەری، هەڵوەشاندنەوەی پشکی حکومەتی عێراق بوو، کە بەپێی ڕێککەوتنی سان-ڕیمۆ ٢٠٪ پێدرابوو بگۆڕدرێت بۆ بڕێك پارە، بۆ جێیبەجێکردنی ئەم خاڵەش وەزارەتی داگیرگاکان لە (٢)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٣) برووسکەیەك بۆ (هێنری دۆبس) دەنێرێت، کە فشار لەسەر حکومەتی عێراق بکات، بۆ ئەوەی دەست لە پشکەکانی هەڵگرێت، کە لە ناوەڕۆکیدا هاتووە: "چونکە ئەم پشکە پێویستی بە بڕی پارەی زۆر هەیە، کە یەك ملیۆن پاوەن دەبێت، حکومەتی عێراقیش ئەوەی پێدابین ناکرێت"، بۆ ئەوەی ڕێگا خۆشبکرێت لە بەشدارکردنی ئەمریکییەکان و ئیتاڵییەکان وتورکەکان لە کۆمپانیاکەدا، بەرامبەر بەوەی حکومەتی تورکیا دان بە سەروەری عێراق لەسەر ویلایەتی موسڵ بنێت. جگە لەوەش دەڵێن: "لە کۆتایی خاوەندارێتیی ویلایەتی موسڵ، ئەم جۆرە قوربانییەی پێویستە، عێراق زۆر سوودمەنتر دەبێت، ئەگەر گرنگی بە سەروەری لە ویلایەتی موسڵ بدات، لەوەی گرنگی بدات بە پشکەکاني لە نەوتدا"[٨٦].

دەربارەی ڕۆڵی ئەمریکا لە کۆنگرەدا، هەرچەندە چەند سەرچاوەیەك ئاماژە بەوە دەکەن، کە ئەمریکا بە هێزو چالاکی زۆر بەشداری نەکردبوو لەم کۆنگرەیەدا[٨٧]، دوایی چەند ڕۆژێك لە دەستپێکردنی کۆنگرەی (لۆزان) وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (چارلس هیۆز-C.Hughes) لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی ڕایدەگەیەنێت، ئەمریکا دەیەوێت پارێزگاری بکات لە مافەکانی و دەستەبەری سیاسەتی (دەرگای کراوە) بکات[٨٨]، سەرۆکی شاندی چاودێری ئەمریکا لە کۆنگرەی (لۆزان) (ڕیتچالد چایلد-R.Child) لە (٢٥)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٢) بەیاننامەکەی(هیون) ی دا بە هەر سێ وڵاتی زلهێز (بەریتانیا، فەرەنسا، ئیتاڵیا)[٨٩]، دەربارەی پرسی نەوت سێ بەرژەوەندی دیارو بەرچاوی ئەمریکی هەولي جێگیرکردنی مافەکانی ئەمریکا لە نەوتی ویلایەتی موسل دەدا، کە پێکهاتبوون لە گرووپی یەکەم: (گرووپی حەوت)، کە کۆمپانیای نەوتی زەبەلاحی ئەمریکا بوون و بەردەوامبوون لە گفتوگۆدا لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی تورکی، تەنها بۆ بەشداریکردنی ئەمریکا لە نەوتي ویلایەتی موسڵدا، دووەم گرووپ: (سەندیکای ئەدمیراڵ چێستەر) بوو، کە بەردەوام بوو لە گفتوگۆ لە ئەنقەرە لەگەڵ تورکەکان بۆ دەستکەوتنی پرۆژەی هێڵی ئاسنی و مافەکانی نەوتی ویلایەتی موسڵ لە چوارچێوەی ئەم پرۆژەیەدا[٩٠]. گرووپی سێیەم: (میراتگرانی سولتان عەبدولحەمید) بوون، کە داوای گەڕانەوەی ئەو ناوچە نەوتیانەیان دەکرد، کە سەر بە خەزینەی تایبەتی سوڵتان بوون، ئیتحادییەکان لە ساڵی (١٩٠٨) دەستیان بەسەریدا گرتبوو، ئەم داواکارانە پێکهاتبوون لە ٢٢ کەسایەتی لە (شازادەو شاژن) لە بنەماڵەی سوڵتان، هەندێك بەرژەوەندی ئەمریکا پاڵپشتی ئەم میراتگرانەی دەکرد لەپێناو دەرکردنی ئیمتیازی نەوت لەم ناوچانەدا. (ساموێل ئینترمایر-S.Untermyer)، کە

پارێزەرێکی ئەمریکی بوو و راوێژکاری یاسایی بۆ ئەو لایەنە، کە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکای پێك دەهێنا[٩١] . کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەمریکا پەیوەندییان کردبوو بە میراتگرانی سوڵتانەوەو بۆ ئەوەش پارێزەر (ساموێل) لە کۆنگرەی (لۆزان) داواکاری پێشکەش کردبوو، دەربارەی مافەکانیان و ئاماژەی کردبوو، کە کۆمپانیای نەوتی (ستاندارد نیوجەرسی) هەوڵی کڕینی مافەکانیانی داوە[٩٢]. ئەم داواکارانە داواکاری تورکیا بوو بۆ گەڕانەوەی ویلایەتی موسڵ بۆ تورکیا، گرووپی حەوت کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەمریکا نیگەران کردبوو. ئەوەتا نوێنەریان (واڵتەر تیگل)، کە بەردەوام بوو لەگفتوگۆ لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی تورکی لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٩٢٢)دا داوایەك پێشکەش بە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا دەکات، دەڵێت: "وا بەباش دەزانم چاوێك بەم هەڵوێستانە بخشێنینەوە"، چونکە بە باوەڕی ئەو ئەگەر کەمالیستەکان پێیان لەسەر گەڕانەوەی موسڵ داگرت، ئیتر هیچ پێویست ناکات ئێمە بەردەوام بین لە گفتوگۆ لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی تورکی، هەروەها داوای زانیاری تەواو دەکات لە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، بەڵام (بیدفۆرد- Bedfort) وەزیری دەرەوە لە (٢٢)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٢) وەڵامی والتەر تیگل دەداتەوە، کە ئیدارەی ئەمریکا هیچ بەرپرسیار نیە لەوەی زانیاری بدات بە گرووپێکی ئەمریکییەوە، کە پەیوەندیی بەنەوتەوە هەبێت[٩٣].

دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر گرووپی ئەمریکا گەیشتنە ئەو قەناعەتە، کە باشترین رێگا ئەوەیە کە بەردەوام بێت لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی تورکی. لە (٢٩)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٢)دا چەند زانیارییەك گەیشتبوون بە ناوەندی سیاسیی ئەمریکا کە ئامۆژگاری دەکات بەوەی دانبنێت بە ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی بۆ دەستەبەرکردنی پشکی ئەمریکییەکان لەم ناوچەیەدا، چونکە ئەگەر هاتوو موسڵ گەڕایەوە بۆ تورکیا یاخود بەپێی بە بەشێك لەم ناوچەیەدا ئەوە مافی کۆمپانیای نەوتی تورکیە، هەم لەلای حکومەتی تورکی هەم لەلایەکی تر ئیمتیازی لەم ناوچەیەدا دەربکرێت، چونکە کۆمپانیا تاکو ئێستا دەستی بەسەر ئەم ناوچەیدا دەڕوات[٩٤] . بۆیە لە (٢٣)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٣) یەکسەر شاندی ئەمریکا بەیاننامەیەکیان خستە بەردەم لیژنەی سەربازی و هەرێمی، کە تیایدا هاتبوو نارەزاییەکی توندیان دەربارەی وەبەرهێنانی سامانەکانی باشووری کوردستان دەربڕی و داوای بەرگرتن لە سیاسەتی (دەرگای کراوە) یان کرد[٩٥] . ئەم هەڵوێستەی ئەمریکا لە پەیرەوکردنی سیاسەتی دەرگای کراوە تەنها بۆ دەستکەوتی پشکێك بوو لە نەوتی ویلایەتی موسڵ بۆ کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەمریکا وەك، لە وتاری رۆژنامەی ئەمریکی (TheChristian Science Monitor) لە ژمارەی (٢)ی شوباتی ساڵی (١٩٢٣) هاتبوو[٩٦] .

شاندی تورکی وەك شاندی بەریتانیا لە کۆنگرەی لۆزان دەیویست دەست بەسەر ئیمتیازی نەوتی ویلایەتی موسڵدا بگرێت، ئەویش بۆ راکێشانی پاڵپشتی و لایەنگری دەوڵەتان بۆ لای دۆزی خۆی، کە بە پێی بنەماکان میساقی نیشتمانی تورکیا، داوای گەڕانەوەی ویلایەتی موسڵی دەکرد بۆ ناو سنوورەکانی دەوڵەتی نوێی تورکیا و پێشتریش خۆیان ئامادەکردبوو، کە کێشەی موسڵ وەك کێشەیەکی سەرەکی دەبێت لە کۆنگرەدا باسبکرێت[٩٧] لە (٢٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٢) لەو رۆژەی کۆنگرە خەریکی تاوتوێی بابەتی کێشەی سنوور بکات لەنێوان تورکیا و عێراقدا، (عیسمەت پاشا ئینینو) سەرۆکی شاندی تورکی لە کۆنگرە، داوای لە (لۆرد کرزن) سەرۆکی شاندی بەریتانیا کردبوو گفتوگۆکان بوەستێنی دەربارەی ئەم بابەتە و چاوەڕوانی ئەنجامی ئەو گفتوگۆیانە بکرێت کە لەنێوانیاندا دەکرا[٩٨] ئەمە تەنها لەبەر ئەوەبوو، کە تورکەکان هەوڵیان دەدا بە نهێنی کۆمپانیا بەریتانییەکان رازی بکەن، ئەوەتا (کرزن) راشکاوانە لە دانیشتنێکی کۆنگرە بۆ تاوتوێکردنی بابەتی کێشەی موسڵ دەڵێت: "شاندی تورکی لە دواوە نوێنەری دەنێرێتە لەندەن، بۆ ئەوەی سەودا لەگەڵ ئیمتیازەکانی کۆمپانیای نەوتی تورکی بکەن، بۆ ئەوەی ئیمتیازی تریان لە نەوتی موسڵ بدەنێ، کە هی خۆیان نییە"[٩٩] . لە (٢٣)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٣) (عیسمەت پاشا) رایگەیاند، کە ئەو بیروبۆچوونەی حکومەتی تورکی دەربارەی بەشداریکردنی زلهێزەکان لە وەبەرهێنانی نەوتی ویلایەتی موسڵ کەس بێ بەش ناکات لە جیهاندا لە نەوتی موسڵ، دوای گەڕانەوەی بۆ سەر تورکیا، هەروەها بەڵێنی دا بەوەی هەموو ئاسانکارییەك بخاتە بەردەم جیهان بۆ ئەوەی سوودمەند بن لەم نەوتەدا[١٠٠].

هاوکات لەگەڵ راگەیاندنی (عیسمەت پاشا)، لە هەمان رۆژدا (٢٣)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٣) سەرۆکی شاندی بەریتانیا (لۆرد کرزن) راپۆرتی خۆی دەخاتە روو دەربارەی کێشەی ویلایەتی موسڵ، لەپاڵ ئەم بابەتە باس لە گرنگی ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی دەکات و هەڵوێستی حکومەتی بەریتانیا، کە قەناعەتی تەواوی هەیە بە شەرعیەتی ئیمتیازی کۆمپانیا، ئەوەشی روون کردبۆوە، کە حکومەتی بەریتانیا و کۆمپانیاکە هەست دەکەن بەوەی نەوت کەرەستەیەکە بۆ بەرژەوەندی جیهانە بەگشتی، هەڵەیە ئەگەر هەوڵی قۆرخکردنی بدرێت. پاشان کۆمپانیاکە بەهاوکاری و زانیاری بەریتانیا دەستی کرد بە گفتوگۆ لەگەڵ لایەنەکانی تر بۆ بەشداری بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتانی تر لەم ئیمتیازە و ئاماژەی کردبوو بەوەی هیچ پەیوەندییەك نیە لەنێوان نەوتی موسڵ و چارەنووسی ئەم ویلایەتەدا، ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ ناو سنوورەکانی عێراق. هەروەك ئاماژە بەوەش دەکات کە هیچ زانیارییەك نییە، سەبارەت بەبڕی نەوتی ئەم ویلایەتە، کە دەتوانرێت بەکاربهێنرێت. ئەگەر ئەم پرۆژەیە سەرکەوتنی تۆمارکرد لەم بوارەدا لە عێراق ئەوە بێ گومان سوودمەندی گەورە، وڵاتی عێراق دەبێت، هەروەها وڵاتی تورکیا سوود وەردەگرێت، لە کۆتاییدا دەڵێت: "ئەمە تەواوی ئەو مەسەلەیە کە پەیوەندی بە نەوتەوە هەیە"[١٠١].
(لۆرد کرزن) ئەوە رادەگەیەنێت کە بەریتانیا زۆر زیانی کردوە لە هەڵوێستەکەی دەربارەی گەڕانەوەی ویلایەتی موسڵ بۆ سەر عێراق بە تایبەتی لە بواری نەوتدا[١٠٢]. وەڵامی ئەو پرسیارەی لۆرد کرزن تەنها بەگەڕانەوە بۆ رابردووی

زیاتر لە ٢٠ ساڵ، چەند ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا بە هەموو دامو دەزگاکانییەوە هەوڵی کۆنترۆلکردنی ئەم ناوچانەی داوە، تەنها لەبەر نەوت، دەربارەی نەبوونی زانیاری، کە چەند بڕ نەوت هەیە لەم ناوچانە، ئەوا بە سەدان راپۆرتی وەزارەتی دەرەوە، وەزارەتی هیند، وەزارەتی داگیرکاکان، دەزگاکانی کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ-فارسی وەڵامی لۆرد کرزنیان دابووەوە.

ئەم هەڵوێستەی بەریتانیا لە ئەنجامی ئەو هێرشە گەورەیەدا بوو، کە لەلایەن رۆژنامەکانی بەریتانی و جیهانی لە کاتی کۆنگرەدا بەرپا کرابوو، کە بەریتانیا تەنها لەپێناو بەرژەوەندییە نەوتییەکەی ویلایەتی موسڵی دەوێت وتا بیگەرێنێتەوە بۆ سەر عێراق[١٠٣]. لە کاتی کۆبوونەوەکانی (لۆزان) پەیامنێری رۆژنامە (The Detroit News) لە لەندەن، جەخت دەکات لەسەر ئەوەی کە نەوت نەك هۆکاری سەرەکییە لە کێشەی موسڵدا، روونیشی کردەوە کە گەورەترین کێڵگەی نەوت لە جیهاندا لە ویلایەتی موسڵ دایەو ئەنقەرە بەهەر نرخێك بێت دەستی لێهەڵناگرێت، کە دەڵێت هیچ سەیر نیە، کە بەم شێوەیە ململانێی لەسەر دەکرێت، چونکە کێڵگەکانی موسڵ دەوڵەمەندترین کێڵگە نەوتییەکانی جیهانن، کە زیاتر لە بلیۆنێك دۆلار مەزەندە دەکرێت، رۆژنامەی (The Dayton News) دەڵێت: "ئەگەر برێکی زۆر لە نەوت لە ویلایەتی موسڵ نەبوایە، هیچ بەرژەوەندییەکی دبلۆماسی لەو وڵاتە بەم شێوەیە نەدەبوو". رۆژنامەی (The Baflof News) دەڵێت:" هەرچەندە کەشتییە جەنگییە نوێیەکان پێویستیان بە برێکی زۆر نەوت هەیە، بەڵام بە دۆراندنی کێڵگە نەوتییەکانی عێراق مەترسییەکی وای بۆ هێزی دەریایی بەریتانی هەیە کە وەك ئەوەیە لە شەرێکی دەریایی گەورەدا دۆرابێت..."[١٠٤]. رۆژنامەی ئەمریکی (The Chicago Tribune) لە ژمارەی رۆژی (٥)ی شوباتی ساڵی (١٩٢٣) دەڵێت: "بەریتانیا بەڵێنەکانی خۆی جێبەجێ دەکات بەرامبەر عەرەب، ئەگەر هاتوو کار گەیشتە ئەوەی پارێزگاری بکات لە کێڵگە نەوتییە دەوڵەمەندەکانی موسڵ..." [١٠٥]، رۆژنامە سۆسیالست وراديکالەکان نیگەرانیی خۆیان دەربڕی بەرامبەر هەڵپەی بەریتانیا، بۆیە رۆژنامەی (The Worker) دەڵێت: "کۆلۆنیالستی بەریتانی دەیەوێت جیهان بەرەو کوشتارگەیەکی نوێ بەرێت لەپێناو پارچەیەك زەویی لە ئاسیا، کە نەوتی لێ هەڵدەقوڵێت"[١٠٦].

بەریتانییەکان دەیانویست هەموو گومانێك لە خۆیان دووربخەنەوە، کە هەڵوێستی بەریتانیا لە لێکدانی ویلایەتی موسڵ هیچ پەیوەندییەکی نیە بە پرسی نەوتەکەیەوە، هەوڵیاندەدا خۆیان نیشان بدەن، کە داکۆکی لەسەر مافی گەلانی (عێراق) دەکەن، چونکە بەپێی بریارەکانی کۆمەڵەی گەلان ئەم ناوچەیە لە ژێر ماندێتی بەریتانیا دایەو لەسەر بەریتانیایە داکۆکی لە مافەکانیان بکات، بەریتانیا بۆ ئەم مەبەستە هانی راگەیاندنی عێراق دەدا، کە ئەم بابەتە بورژێنن و داکۆکی بکەن لەسەر ویلایەتی موسڵ. لە رۆژنامەی (العاصمة البغدادية) لە سەرووتاری ژمارەی (٧)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٢٢) نووسیبووی: "بە باشی دەزانین لە کۆنگرەی لۆزان، ئاراستەی هاوپەیمانی بکەین، ئەوان هەڵەیەکی گەورە دەکەن گەر لە باوەریان دابێت رێککەوتن لەگەڵ مستەفا کەمال بۆ دابەشکردنی عێراقە، چونکە عێراقییەکان جیاوازی ناکەن لەنێوان تورکیاو خەڵکانی تر بەرامبەر ژیان و بەرژەوەندییەکانی تری عێراقییەکان. ئەوەی دەست درێژی بکاتە سەر بیرە نەوتییەکانمان، ئەوا بە دوژمنی گەورەی خۆمانی دەزانین، لەم بوارەدا جیاوازی نیە لەنێوان مستەفا کەمال و هاردنیگ و کرزن و پوانکاری"[١٠٧].

لە بواری رۆڵی رۆژنامەکانی جیهانی و ناوچەکەدا لە کێشەی پرسی نەوتی ویلایەتی موسڵ لە کۆنگرەی لۆزان شایەنی باسکردنە، کە رۆژنامەی (رۆژی کوردستان) لە ژمارەی (٦) لە (٢٧)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٢٢) وتارێك بڵاودەکاتەوە بە ناوی (ویلایەتی موسڵ لە لۆزان) دەڵێت: ئەگەر هەموو دانیشتووانی ویلایەتی موسڵ کورد بوون، بۆچی نەتەوەکانی تر داوای دەکەن...تورکەکان و عەرەب و ئاشوورییەکان بەهۆی ژمارەیەکی کەم لە نەتەوەکانیان لەم ناوچەیە دەژین، خۆیان بەو پشت ئەستوورییە داوای ئەم ناوچەیە دەکەن...بەڵام داواکاری ئێمە تەنها بۆ پارێزگاری کەمینەیی نییە، بەڵکو بۆ پاراستنی ماف و ژیانی گەلێکی گەورەو سەربەخۆو خاوەن نیشتمانێك[١٠٨].

ئەم وتانەی لۆرد کرزن هیچی لە هەڵوێستی ئەمریکا نەگۆڕیی، بەڵکو لە هەمان رۆژی (٢٣)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٣) نارەزایی خۆی نیشان دا لە راگەیاندنێکدا، کە دابووی بەدەست لۆرد (کرزن) بۆ وەبەرهێنانی نەوت لە کێڵگەکانی ویلایەتی موسڵ لە رێگای قۆرخکردنییەوە، هەروەها راگەیاندرا بوو، کە هەڵوێستی ئەمریکا پەیرەوکردنی سیاسەتی (دەرگای کراوە)یە[١٠٩].

هەرچۆنێك بێت قۆناغی یەکەمی کۆنگرەی (لۆزان) شکستی هێنا، بە هۆی ئەو ئاژاوەو ناکۆکی و ململانێیەی لەنێوان زلهێزەکان لەسەر دۆزی ویلایەتی موسڵ و پرسە نەوتەکەیدا هەبوو، کە زیاتر ململانێیەکە لەنێوان تورکەکان و بەریتانییەکان لەلایەك و لە لایەکی تردا لەنێوان ئەمریکاو بەریتانییەکاندا بوو، بەڵام ئەوەی دیارە بەریتانییەکان توانیبویان ئیتالییەکان و فەرەنسییەکان بۆ لای خۆیان رابکێشن، ئەوەتا دەڵێن، کاتێك تورکەکان هەوڵی راکێشانی فەرەنسییەکان دەدەن لە کۆنگرەدا، بەڵام وەڵامی فەرەنسیەکان بۆ تورکەکان ئەوە بوو، کە لەگەڵ بەریتانییەکان رێبککەون زۆر باشترە بۆ تورکەکان، چونکە ئەگەر ناکۆکی روویدا لەنێوان تورکیاو بەریتانیا، ئەوا فەرەنسا لایەنگری بەریتانیا دەکا[١١٠].

کاتێك قۆناغی دووەمی کۆبوونەوەکانی (لۆزان) لە (٢٣)ی نیسانی ساڵی (١٩٢٣) دەستپێکرد، تورکەکان جارێکی دیکە سوودیان لە بەرهەڵستی وداواکارییەکانی ئەمریکا وەرگرت، تا بۆ لای خۆیانی راکێشن و بەڵێنی بەشێکی گەورەی بدەنێ لەهەر پشکێك، کە دەستیان دەکەوێت لە لای دەوڵەتێکی تر لە نەوتی ویلایەتی موسڵدا، بەرامبەر بە پشتیوانی ئەمریکییەکان لە خواستەکانی تورکیا، لە (١٠)

ی نیسانی ساڵی (١٩٢٣) ئەنجوومەنی نیشتمانی تورکی باوەڕی بە ئیمتیازی (چێستەر) هێنا بە زۆرینەی ١٤١ دەنگ بەرامبەر بە ١٦ دەنگی نارەزایی[١١١]، هەروەها ئەم پرۆژەیە زۆر گرنگ بوو بە جۆرێك سێ ئەوەندەی ئیمتیازی پێشووتر بوو، کە خۆی لە پرۆژەی هێڵی ئاسنین و لەگەڵ ماف وەبەرهێنانی نەوتی موسڵ دا بوو[١١٢]، بەریتانییەکان بە توندی لە دژی ئەم پرۆژەیەی (چێستەر) وەستان، چونکە دەیان گووت بە ناوچەکانی موسڵ دەڕوات، ئەم ناوچەیە لە ناوچەیەکی عێراقی دایە[١١٣]، فەرەنسییەکانیش نارەزا بوون، چونکە داوای هەمان ئیمتیازیان دەکرد، کە پێش جەنگ پێیان درابوو لەلایەن عوسمانییەکانەوە[١١٤]، هەر چەندە ئەم ئیمتیازە وەك سەرکەوتنێکی سەرمایەداریی ئەمریکا هەژماردەکرا، بەڵام وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا هیچ پشتیووانی لەم ئیمتیازە نەکرد، چونکە ئەمریکا پشتیووانی لە کۆمپانیا ئەمریکاییەکان نەدەکرد بۆ دەستکەوتنی ئیمتیازی نەوت لە عێراق، هەر تەنیا بۆخۆیان، بەڵام لە لایەکی تر کار دەکرا بۆ بەرژەوەندیی پیشەسازیی نەوتی ئەمریکا بە کۆمەڵ و لە ژێر سیاسەتی (دەرگای کراوە)دا[١١٥].

لە لایەکی تر پەیوەندییەکان بەردەوام بوون لەنێوان کۆمپانیای نەوتی تورکی و نوێنەرانی گرووپی ئەمریکی لە لەندەن و نیویۆرك، ئەوە پێشنیازی ئەمەریکییەکان بوو کە کۆنگرەیەك لە نیویۆرك لە ماوەی (٢٥)ی ئادار بۆ (١٤)ی نیسانی ساڵی (١٩٢٣) ببەسترێت، هەردوو لایەن گەیشتنە شێوازێکی نوێ لە سیاسەتی(دەرگای کراوە) بە مەرجێك کۆمپانیای نەوتی تورکی (٢٤) پارچە زەوی نەوتاویی هەڵبژێرێت، کە هەریەك لەم پارچانە ٨ میل چوار گۆشە بێت، لە ماوەی دوو ساڵ بە پێی گرێبەستی رێککەوتن لەگەڵ حکومەتی عێراقدا، ئەو پارچانەی دەمێننەوە لە ناوچەکانی ئیمتیاز (پارچەی دەرەوە) بخرێنە بەردەم مزایەدەیەکی ئاشکرا لەلایەن کۆمپانیای نەوتی تورکییەوە، لە کاتی دیاریکراودا، کە ئەمەش جگە لە کۆمپانیا هەموو بەرژەوەندی ولایەنەکان بگرێتەوە[١١٦].

گرووپی ئەمریکی داواکاری پێشکەش کردبوو بە دانانی رێککەوتنێك (Working Agreement) بۆ چاودێری کارەکانی کۆمپانیا و سیاسەتی ناوخۆیی، وەك مەرجێکی سەرەکی بۆ بەشداربوونیان لە کۆمپانیادا، هێڵە گشتییەکانی ئەم رێککەوتنە پێکهاتبوو لەوەی کۆمپانیا پرۆژەیەك بێت، تەنها قازانج ئامانجی نەبێت، بەڵکو هەر بەشداربوویێك پشکی خۆی هەبێت لە نەوتی خاو بە نرخی تێچوون و کرێی گواستنەوە و قازانجێکی کەم[١١٧]. بەڵام بە شداربووان نەگیشتنە رێککەوتنێکی کۆتایی بەهۆی نارەزایی (گوڵبەنگیان)، چونکە ئەم جۆرە پێشنیازە زەرەربوو بۆی، چونکە هیچ پاڵاوگەو کەرەستەی پاڵاوتنی نەوتی نەبوو، هەرەشی کرد ئەگەر ئەم جۆرە رێککەوتنە ئەنجام بدرێت ئەوا سکاڵا لەسەر کۆمپانیاکە بەرز دەکاتەوە. ئەوەی شایەنی باس بێت زلهێزەکان ئەم جۆرە رێککەوتنەیان بە باش دەزانی، چونکە زۆرترین قازانجیان دەست دەکەوت[١١٨]، ئەم هەڵوێستەی (گوڵبەنکیان) بەریتانیای زۆر نیگەران کردبوو، چونکە مەترسی هەبوو لە کاتی مۆرکردنی رێککەوتنێك لە کاتی عێراق و کۆمپانیا بەرەورووی دادگا بڕوات، ئەگەری کشانەوەی ئەمریکاییەکانی لێبکەوێتەوە، ئەم دەرفەتە بقۆزێتەوە بۆ ئەوەی داواکاری نوێ پێشکەش بکەن لەلایەن حکومەتی عێراق بۆ دەستکەوتنی ئیمتیازی راستەوخۆ[١١٩]، بەریتانییەکان مەترسییان لەوەش هەبوو چیتر ناتوانن فشار بخەنە سەر حکومەتی عێراق، پێدابگرن لەسەر ئەم ئیمتیازەدا، ئەگەر حکومەتی عێراق ئەم ئیمتیازەی رەتکردەوە بە بەخشینی کۆمپانیای نەوتی تورکی، ئەوە حکومەتی بەریتانیا بەرامبەر بە حکومەتی فەرەنسی و ئەمریکی دەشلەژێ لەلایەك، لە لایەکی تریشەوە زۆر نیگەران دەبێت لە بەرامبەر هەڵوێستی فەرەنساو تورکیا، چونکە ناچار دەبن بە قەرەبوو کردنەوە ئەگەر دەستمان لە ناوچەکانی موسڵ هەڵگرین[١٢٠].

دوای ئەوەی بەریتانییەکان توانیان گرووپی ئەمریکی بۆ رێککەوتنی سەرەتایی لەسەر پرسی ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی رابکێشن، هەموو مەرامەکانی تورکیا بۆ راکێشانی لایەنی ئەمریکی بۆ سەر دۆسیەکەی هەڵوەشایەوە، سەبارەت بە کێشەی سنووری موسڵیش بەریتانییەکان توانیان سەرکەوتنێکی کاتی بەدەست بهێنن، بۆیە (لۆرد کرزن) زۆر بە روونی ئاماژەی کرد لە کۆنگرەدا، کە ئەم جۆرە کۆبوونەوانە ناتوانن چارەسەرێك بۆ کێشەی ویلایەتی موسڵ بدۆزنەوە، بۆیە داوای کرد ئەم کێشەیە بەرزبکرێتەوە بۆ لیژنەی جێبەجێکارو سەربەخۆ لە بڕیارەکانی لەلایەن کۆمەڵەی گەلان[١٢١]، هەر چەندە شاندی تورکی رەتیکردەوە، کە کێشەکە ببردرێتە بەردەم ناوبژیوانی نێودەوڵەتی، چونکە تورکیا مەهانەی دەهێنایەوە بەوەی هێشتا سەروەری لەسەر ویلایەتی موسڵ ماوە[١٢٢].

(سیر هۆراس رۆمبۆلد-S. H. Rumbold)، کە سەرۆکایەتی شاندی بەریتانیای دەکرد لە قۆناغی دووەمی کۆنگرەی لۆزاندا، پێشنیازی هەبوو لە ناو کۆنگرەی لۆزان بەرامبەر تورکیا، دەڵێت: "لە ئەستۆی من دایە، کە ئامۆژگاری بەدەم بە هەموو رێگاکان، کە حکومەتی من (بەریتانیا) چاوی لە هەموو ئەو گرێبەست و بەڵێنانەیە کە لەلایەن حکومەتی عوسمانی لە ساڵی (١٩١٤) درابوون پێی، دەربارەی کۆمپانیای نەوتی تورکی، پاراستنی بە هێزی ئەم داواکاریان بکات بەشێوەیەکی گەورەو شەرعیەت هێنانی لە ئەستۆی حکومەتی تورکی دایە، لەسەر هەموو ئەو ناوچانەی، کە هێشتا بە تورکی ماون دوای بەرپابوونی ئاشتی"[١٢٣].

(کرزن) زۆر بە توندی داوای ئەم پێشنیازە دەکات و بە ئامادەبووان رادەگەیەنێت، ئەگەر ئەم جۆرە چارەسەرە پەیرەو نەکرێت، بارودۆخ بەرووی جەنگ دەڕوات، چونکە هێزەکانی تورکیا جموجۆڵیان کردەوە لە ئەنقەرەوە بەرەو موسڵ، بۆیە دەبێت بڕیاری سیاسی دەربچێت[١٢٤].

چەندین هۆکار هەبوون لە هەڵوێستی تورکیا لە دژ گواستنەوەی کێشەی ویلایەتی موسڵ بۆ بەردەم (کۆمەڵەی گەلان) و لە (٢٤)ی شوباتی ساڵی (١٩٢٣) (عیسمەت پاشا) پێشنیازی کردبوو، کە کێشەی موسڵ بسپێرێتەوە لە ناو

پرۆگرامی كۆنگرەدا، چونكە بۆ ماوەی ساڵێك لەوانەیە هەردوو لایەن توركیا وبەریتانیا بگەنە رێگا چارەیەك بۆ ئەم كێشەیە، ئەگەر چارسەر نەكرا، ئینجا بگوازرێتەوە بۆ كۆمەڵەی گەلان، بەڵام لە كۆتاییدا شاندی بەریتانیا بە سەرۆكایەتی (سیر هۆرس رۆمبۆلد) جەختی كردەوە لەسەر ئەوەی بریارێك تۆماربكرێت لە ناو كۆنگرەدا، ئەگەر ئەم كێشەیە چارەسەر نەكرێت بۆ ماوەی ساڵێك ئینجا بگوازرێتەوە بۆ كۆمەڵەی گەلان[١٢٥].

كۆبوونەوەكانی كۆنگرەی (لۆزان) لە (٢٤)ی تەمموزی ساڵی (١٩٢٣) كۆتایی هات، كە چەندین كێشەی چارەسەركردو چەندین كێشەی بە بێ چارەسەری هێشتەوە لەوانە: لەناوبردنی برگەكانی پەیمانی سیڤەر، ئەو پەیمانەی كەمالیستەكان زۆر بە توندی لە دژی وەستابوون، لۆزان كاری كرد بۆ رێكخستنی پەیوەندییەكانی نێوان دەوڵەتە زلهێزەكان لە لایەك و لەگەڵ توركیا لە لایەكی ترەوە لە هەموو بوارە سیاسیی و كۆمەڵایەتی و دارایی و ئابوورییەكان[١٢٦].

دەربارەی پرسی نەوت و بەشداری زلهێزەكان لە كۆمپانیای نەوتی توركی، كە ئیمتیازی نەوتی ویلایەتی موسڵ بە شەرعیەت زانی بەپێی دوو برگە لە بەشی یەكەم و بەشی دووەم:

بەشی یەكەم، برگەی (١): "ئەو رێككەوتن و ئیمتیازانە ورێككەوتنی دواتر، كە بەشێوەیەكی یاسایی ئەنجام دراوە پێش (٢٩)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (١٩١٤) لەنێوان حكومەتی عوسمانی (یاخود هەر دەسەڵاتێكی هەرێمی) لەلایەك و (هاووڵاتیان و كۆمپانیاكان) دەوڵەتانی گرێبەست (بێ توركیا) لەلایەكی تردا، هەر بەكاریگەری دەمێنێتەوە.

بەشی دووەم، برگەی(٩): "ئەو زەویانەی داماڵراون لە توركیا بەپێی پەیمانی ئاشتی، كە لەم رۆژە مۆركراوە، ئەو دەوڵەتانەی جێگای توركیا دەگرنەوە لەو زەویانەدا بەرپرسن لە هەموو ماف وئەركەكان بەرامبەر رەعیەتەكانی ئەو دەوڵەتانەی گرێبەستی دەكەن، بەرامبەر ئەو كۆمپانیایانەی كە سەرمایەكانیان لە هەمان هاووڵاتیانی ئەم دەوڵەتانەیە، ئەوانەی دەستكەوتی گرێبەستی ئیمتیازیان وەرگرتووە لە بەرواری (٢٤)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (١٩١٤) لەلایەن حكومەتی توركیا یاخود لەلایەن هەر دەسەڵاتێكی هەرێمی ترەوە"[١٢٧].

كۆنگرە توانیوویەتی بۆ یەكەم جار گرووپی كۆمپانیا ئەمریكاییەكان رابكێشێت بۆ كۆبونەوەی فەرمی لەگەڵ كۆمپانیای نەوتی توركی، ئەمەش خۆی لە خۆیدا دانپێدانێكی سەرەتایی ئەمریكایە بە شەرعیەتی ئیمتیازی كۆمپانیا، هەروەها فەرەنسییەكان دەستەبەری هەمان پشكیان كرد، كە بەپێی سان- ریمۆ پێیان درابوو، كە بناغەی دامەزراندنی سیاسەتی نەوتی لێكەوتەوە بۆ فەرەنسا و لە ئەیلولی ساڵی (١٩٢٣) سەرۆك وەزیرانی فەرنسا (رایمۆند پوانكارێ-Raymond Poincare) راسپێردرا داوا لە هەندێك سەرمایەداری فەرەنسی بكات بۆ دامەزراندنی كۆمپانیایەكی نەوتی بۆ ئەم مەبەستە، كۆنگرە توانیوویەتی رەزامەندی كۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ-فارسی وەربگرێت بۆ ئەوەی پشكەكانی ئەمریكا لە ئایندەدا بخاتە ئەستۆی خۆی لەو پشكەی هەیبوو لە كۆمپانیای نەوتی توركی، كۆنگرەش ماف بەخشی بە حكومەتی عێراق، كە توانای هەیە لە ئایندەیەكی نزیك ویلایەتی موسڵی بۆ بگەرێنێتەوە و سوود لە وەبەرهێنانی نەوت وەربگرێت، ناوچەكە بكاتە شوێنی خزمەتی بەرژەوەندییەكانی حكومەتی نوێی عێراقی عەرەبی[١٢٨].

دەربارەی كێشەی سنووری نێوان عێراق-توركیا، كە لەسەر ویلایەتی موسڵ بوو، كۆنگرە بریاریدا لە مادەی سێی برگەی دوو بەم شێوەیە: "كێشە سنوورییەكانی نێوان توركیا و عێراق رێكدەخرێن بە پێی رێككەوتنێكی دوو قۆڵی لەنێوان بەریتانیا و توركیا لە ماوەی نۆ مانگدا، ئەگەر لیژنە چارەسەری نەكرد لەم ماوەیەدا، ئەوا ئەم كێشەیە دەگوازرێتەوە بۆ بەردەم كۆمەڵەی گەلان، بە یەك شێوە مامەڵە لەگەڵ توركیا و بەریتانیا دەكرێت، تاكو بریاری رێككەوتن دەردەچێت، هیچ چالاكی سەربازی ناكرێت بۆ گۆرینی سنووری ویلایەتی موسڵ، تاكو چارەنووسی كۆتایی دیاری دەكرێت بە پێ رێككەوتنێك"[١٢٩]. هەروەها بە هۆی كۆنگرەی لۆزان پرۆژەی چێستەر هەڵوەشایەوەو هیچ حسابێك بۆ میراتگرانی سوڵتان نەكرا[١٣٠].

دەربارەی ئیمتیازی كۆمپانیای نەوتی توركی، هەر چەندە بەریتانییەكان بەردەوام جەختیان لەسەر داواكاری كۆمپانیا دەكردەوە كە مافی نەوتی پێ بەخشراوە لەسەر ناوچەكانی موسڵ، بەڵام توركەكان بە پاڵپشتی ئەمریكا ئەم داواكارییەیان رەتدەكردەوە، لە ئەنجامی كۆنگرەشدا بەریتانیا نەیتوانی ئەم داواكارییەی كۆمپانیا بسەپێنێت بە سەر توركیا، یاخود توركیا بەدرێژایی كۆنگرە هیچ دانێكی بەم ئیمتیازە نەنا[١٣١].

ئەوەی زۆر روون بوو لە كۆنگرەدا، كە هەم كێشەی سنووری ویلایەتی موسڵ و هەم دانیشتووانی ناوچەكە، كە زۆرینەی كورد بوون هیچ چارەسەرێكیان بۆ نەدۆزرایەوە لەم كۆنگەرەیەدا، بەڵام هەردوو دۆزەكە گوازرانەوە بۆ سەر مێزی گفتوگۆكانی كۆمەڵەی گەلان، لەوەش زیاتر ئەو مافانەی رابردوو بە پێی پەیمانی سیڤەردا پێیان درابوو، كرایە قوربانی بەرژەوەندیی زلهێزەكان و لەبەر چاوی كالی (مستەفا كەمال) هیچ باسی لێوە نەكرا، تەنانەت ئەو بەڵێن و مافانەی درابوون لەلایەن بەریتانیا و توركەكان هیچیان جێبەجێنەكرد، هۆیەكەشی تەنها بۆ بەرژەوەندییە نەوتییەكان دەگەرێتەوە[١٣٢].

هەندێك سەرچاوە ئاماژە دەكەن بەوەی بەستنی پەیمانی لۆزان، سەرەتایەك بوو بۆ پلانەكانی بەریتانیا بۆ خۆدزینەوە لەو بەڵێنانەی دابوی بە گەلی كورد، كە لە برگەكانی پەیمانی سیڤەر بە ئاشكرا پەشیمان بوونەوە ودەستیان كرد بە تەكتیك كردن بەرامبەر بە توركەكان، هیچ مافێكیان نەدا بە كورد، هیچ باسێك نەكرا لە پەیمانی سیڤەر لەگەڵ ئەوەی بەریتانییەكان بەردەوام بوون لە گفتوگۆ بۆ چۆنییەتی چارەسەری كێشەو ناكۆكییەكانی بە شێوەیەكی سیاسی و دبلۆماسی لەگەڵ توركەكان[١٣٣].

*** ئەنجام:**

باروودۆخی دوای جەنگی یەکەمی جیهان تا کۆتایی بە کۆنگرەی (لۆزان) لە ساڵی (١٩٢٣) دێت، باروودۆخێکی پڕ لە گۆڕانکاری لە سیاسەتی زلهێزەکاندا بەدی دەکرێت لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و هەرێمیدا، بەتایبەتی لەسەر چارەنووسی گەلی کوردستان، بۆیە دابەشکردنی کوردستان بەگشتی ویلایەتی موسڵ، کە زۆرینەی بەشەکانی باشووری کوردستانی دەگرتەوە، لەسەر بنەمای هاوسەنگی هێزو بەرژەوەندییە باڵاکان و بەتایبەتی بەرژەوەندی نەوت لەنێوان وڵاتە زلهێزەکانی جیهان و دەوڵەتە هەرێمییەکانی وەك تورکیای نوێ و عێراقی عەرەبی نوێ دابەشکرا، فاکتەری بنچینەیی چاوتێبڕینی هەمووان بوو بۆ دەسکەوتنی پشکێك لە نەوتی ناوچەکەو بەتایبەتی نەوتی کەرکوکی چاوەڕوانکراو دەتوانین بڵێین کە چارەنووسی گەلی باشووری کوردستان لە ڕێککەوتن و بەڵێنەکانی زلهێزەکان کەوتە ژێر کاریگەری توێندی مەسەلەی نەوتی ویلایەتی موسڵ و ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکییەوە.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. فوئاد حەمە خورشید:کەرکوك لە بەڵگەنامەکاندا، ور/ نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو، دەزگای وەرگێڕان، هەولێر، ٢٠٠٧، ل١٢٠.

٢. Stanley K. Hornbeck, Edward Grigg: The Struggle for Petroleum, Sage Publications, Inc. Annals of the American Academy of Political and Social Science, Vol. ١١٢, Raw Materials and Foodstuffs in the Commercial Policies of Nations (Mar., ١٩٢٤), p.١٦٤

٣. بیار مصطفى سیف الدین: السیاسة البریطانیة تجاه تورکیاواثرها في کوردستان١٩٢٣-١٩٢٦، دار سپیرێز، اربیل، ٢٠٠٤، ص ص ٦٠-٦١.

٤. مارف عمر گوڵ: مەسەلەی کورد لە ڕێککەوتن نامە نێودەوڵەتییەکانی سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژمارە ٢، ساڵی چواردەهەم، سلێمانی، ئابی ٢٠٠٦، ل٩٦.

٥. سعد بشیر اسکندر: من التخطیط الى التجزئة(سیاسة بریطانیا العظمى تجاه مستقبل کردستان ١٩١٥-١٩٢٣)، بنکەی ژین، السلیمانیة، ٢٠٠٧، ص ص٢٤٤-٢٤٦.

٦. بڕوانە، کمال مظهر احمد: کردستان في سنوات الحرب العالمیة الأولى، ت/محمد الملا عبدالکریم، المجمع العلمي الکردي، بغداد، ١٩٧٧، ص٣٤٤;لازاریف واخروون: تأریخ کوردستان، ت/عبدي حاجي، ط١، دار سپیرێز، اربیل، ٢٠٠٦، ص ص ١٩٥-١٩٦; عبدالرحمن قاسملو:کردستان والکرد، دراسة سیاسیة واقتصادیة، ت/ثابت منصور، ط٢، السلیمانیة، ٢٠٠٨، ص٦٢;حامد مەحموود عیسى: القضیة الکردیة في العراق من الاحتلال البریطاني الى الغزو الامریکي(١٩١٤-٢٠٠٤)، ط١، مکتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠٥، ص١٢٠.

٧. بەندەکانی(٦٤، ٦٣، ٦٢) کە پەیوەندی بە دۆزی کورد هەبوو بەم شێوەی خوارەوە هاتبوو:

(٦٢): لیژنەیەك پێك دێت لەماوەی شەش مانگ دوای بەڕێوەبردنی ئەم پەیمانە کە نوێنەری هەر سێ زلهێز ئامادە دەبن لە ناویدا، پرۆژەیەکی خودمختاری بۆ ئەو ناوچانە، کە زۆرینەی دانیشتووانی کوردن ودەکەونە ڕۆژهەڵاتی فورات و باشووری سنووری ئەرمینیاو سەرووی سوریا ومیزۆپۆتامیا دادەڕێژن، ئەم پرۆژیە پێشکەش بەو دەوڵەتانە دەکرێت، کە ڕاستەوخۆ بەرپرسن لە بەڕێوەبردنی ئەم ناوچانەدا...، هەروەها لیژنەیەك لە نوێنەرانی دەوڵەتانی بەریتانیاو فەرەنساو ئیتالیا ئێران کوردستان پێکدێت، بۆ هەڵسەنگاندنی پرۆژەکە، ئەگەر پێویست بوو پێداچوونەوەی تێدا دەکرێت، هەر ئاڵوگۆڕێك، کە بەپێی ئەم پەیمانە لە سنووری تورکیا بکرێ، ئەوا ئەو ئاڵوگۆڕانە لەگەڵ سنووری ئێران یەك دەخرێنەوە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، فاضل حسین: مشکلة الموصل(دراسة في الدبلوماسیة العراقیة- الانکلیزیە-الترکیة وفي الراي العام)، ط٣، مطبعة اشبیلیة، بغداد، ١٩٧٧، ص١٣; شاکر خصباك: الکرد والمسالة الکردیة، ط٢، بیروت، ١٩٨٩، ص٤٠; فواد حمة خورشید: القضیة الکردیة في المؤتمرات الدولیة...، ص٥٧; گوینتەر دیشنەر: کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، و/حەمە کریم عارف، چ٢، هەولێر، ١٩٩٩، ل٧٤.

(٦٣): حکومەتی عوسمانی بەڵێن دەدات بە پەسندکردنی بڕیاری هەردوو لیژنەکان، کە لە بەندی(٦٢)هاتووە ولە ماوەی سێ مانگ دوای ڕاگەیاندنی فەرمی دەخرێتە بواری پراکتیزەکردنەوە، بڕوانە، کمال مظهر احمد: کوردستان في السنوات الحرب...، ص٣٤٥; لازاریف واخروون: تأریخ کوردستان...، ص١٩٦; فؤاد حمە خورشید: القضیة الکردیة في ...، ص٥٧.

(٦٤): لەم بەندەدا هاتووە ئەگەر زۆرینەی کوردەکانی ئەو ناوچانەی لە بەندی(٦٢) ئاماژەیان پێکراوە داوای سەربەخۆییان کرد، هەروەها ئەگەر کۆمەڵەی گەلان گەیشتە ئەو باوەڕەی کە کوردەکان شیاوی ئەم مافەن، دەبێت دەوڵەتی عوسمانی بەڵێن بدات ئەم ڕاسپاردانە پەسەند بکات ودەست بەرداری هەموو مافەکانی خۆی بێ لەم ناوچەیەدا، هەروەها ماوەی یەك ساڵ دانرا بۆ جێبەجێکردنی ئەم بەندە، ئاماژەش کرابوو ئەگەر کوردەکانی ویلایەتی موسڵ ویستیان بە خواستی خۆیان بچنە پاڵ ئەم دەوڵەتە، نابێت هاوپەیمانان هیچ ڕێگرییەك بکەن لەم داواکاریەدا. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، عبدالرزاق الحسني: تأریخ الوزارات العراقیة، ج١، ط٢، صیدا، ١٩٥٣، ص٢٨٠; حامد مەحموود عیسى: المشکلة الکردیة في الشرق، مصر، ١٩٩٢، ص٥٩; حسێن مەدەنی: کوردستان وستراتیژی دەوڵەتان، بەرگی یەکەم، هولێر، ٢٠٠٩، ل ل ٢٣٣-٢٣٤; ارشاك سافراستیان: الکرد وکردستان، ت/احمد محمود الخلیل، ط١، دمشق، ٢٠٠٨، ص١١٠.

٨. کامەران ئەحمەد محەمەد: کوردستان لەنێوان ململانێی

نێودەوڵەتیی وناوچەییدا(١٨٩٠-١٩٣٢)، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ١٤٦.

٩. سعد بشير اسكندر، المصدر السابق، ص٢٢٧.

١٠. م.س.لازاريف: المسألة الكوردية(١٩٢٣-١٩٤٥) النضال والاخفاق، ت/عبدي حاجي، ط١، اربيل، ٢٠٠٧، ص٧٧; فؤاد حمه خورشيد: القضية الكردية في المؤتمرات الدولية...، ص٥٨.

١١. مارف عومەر گوڵ: سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٩.

١٢. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی سیاسەتی بەریتانیا لەسەر ناوچەکانی کەرکوك ودەورووبەری لە دوای پەیمانی سیڤردا، بڕوانە، وليد حمدي: الكورد و كوردستان في الوثائق البريطانية دراسة تأريخية وثائقية، لندن، ١٩٩١.، ص ٩٦; كمال مظهر احمد: كركوك وتوابعها حكم التأريخ والضمير(دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق)، ج١، مطبعة رينوين، حكومة اقليم كردستان، د.ت، ص ص١٦٠-١٧٨; پشکۆ حمه تاهیر: شاری کەرکوك(١٩١٧-١٩٢٦)، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ل ١٧٩-١٨٠.

١٣. فاضل حسين: المصدر السابق، ص ١٢-١٥; جرجيس فتح الله: يقظة الكرد، تأريخ سياسي١٩٠٠-١٩٢٥، دار ئاراس، اربيل، ٢٠٠٢ ، ص٢٣٤.

١٤. اندره نۆسشي: الصراعات البترولية في الشرق الاوسط، ت/ اسعد محفل، دار الحقيقة، ط١، بيروت، ١٩٧١، ص ص١٢٨-١٣١ ;عبدالحميد العلوجي و اللامي: الاصول التأريخية للنفط العراقي، ج١، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٣، ص ص٢٣١-٢٣٢.

١٥. کامەران ئەحمەد محەمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٠.

١٦. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی هۆکارەکانی بەرپابوونی شۆڕشی ١٩٢٠ی بە ناوبانگ لە میزۆپۆتامیا، بڕوانە، سر المرهولدين: ثورة العراق ١٩٢٠، ت/فؤاد جميل، ط١، بيروت، ٢٠١٠، ص ص ٩-١٢.

١٧. رجاء حسين الخطاب: عبد الرحمن النقيب(حياته الخاصة و اداءة السياسي وعلاقتة لمعاصريه)، ط١، بغداد، ١٩٨٧، ص٢١; لەراستیدا هەر لەئەنجامی شۆڕشدا بەریتانییەکان هەڵسان بە گۆڕینی حاکمی گشتی لە ١٩٢٠/١١/١١ لە ئەرنۆڵد ولسون بۆ پیرسی کۆکس، کە بە مەزەندەی بەریتانییەکان ئەم کەسایەتییە زیاتر میانڕەوترە لە مامەڵەکردن، بڕوانە، عبد الرزاق الحسني:عراق قديماً وحديثاً، ط٣، مطبعة العرفان، صيدا، ١٩٥٨، ص٣١.

١٨. اندره نۆسشي: المصدر السابق، ص٧٨; مجموعة من الباحثين السوفيت: تأريخ تركيا المعاصر، ت/هاشم صالح التكريتي، سليمانية، ٢٠٠٧، ص ص ٥٨-٥٩.

١٩. عبدالرحمن قاسملو: المصدر السابق، ص٦٤.

٢٠. دەربارەی ناوەڕۆکی ئەم یادداشتەی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ لۆرد کرزن، بڕوانە، قاسم احمد العباس: وثائق النفط في العراق، ج١، شركة النفط الوطنية العراقية، بغداد، ١٩٧٥، ص ص٨٨-٩٣;يوسف ابراهيم يزبك: النفط مستعبد الشعوب، ج١، مطبعة الفن الحديث، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٣٤، ص٢٨٢.

٢١. Petroleum affairs، in، R.O.I، ٣ Vol ١٩٢٣-١٩٢٤، pp.٤١٠-٤١١; قاسم احمد العباس: المصدر السابق، ص ص ٩٤-٩٩.

٢٢. نوري عبدالحميد خليل: التأريخ السياسي لامتيازات النفط في العراق(١٩٢٥-١٩٥٢)، مطبعة الرابطة، بيروت، ١٩٨٠.، ص٤٧.

٢٣. جرجيس فتح الله: النفط قرر مصير كوردستان السياسي، مجلة الثقافة الكردية، العدد(٢) اذار١٩٩٠.لندن، ص١٦; الحزب الديمقراطي الكردستاني (المكتب السياسي) مكتب الدراسات والبحوث المركزي:نفط كوردستان العراق، ج١، ط١، هەولێر، ١٩٩٧.، ج٢، ص١٨.

٢٤. عبدالرزاق الحسني:تأريخ العراق السياسي الحديث، ج١، ط٧، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٩، ص٩٤.

٢٥. عبدالرحمن البزاز: العراق من الاحتلال حتى الاستقلال، بغداد، ١٩٦٧، ص١٣.

٢٦. م.س.لازاريف: المسألة الكوردية(١٩١٧-١٩٢٣)، ت/ عبدي حاجي، ط١، بيروت، ١٩٩١، ص٥٤

٢٧. جرجيس فتح الله: يقظة الكرد...، ص٢٣٥.

٢٨. ئەحمەدعوسمان ئەبوبەکر:کوردستان لەسەردەمی ئاشتیدا، ور/موحەمەد نوری تۆفیق، دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ل٩٦-٩٧;کامەران ئەحمەد محەمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل ل ١٤٩-١٥٠ ; فؤاد حمه خورشيد: القضية الكردية في المؤتمرات الدولية...، ص ص ٨٠-٨١.

٢٩. كمال مظهر احمد:اضواء على القضايا، ص٢٤٣; مجموعة من الباحثين السوفيت;تأريخ تركيا المعاصر، ص ص٦١-٦٤.

٣٠. سعد بشير اسكندر:المصدر السابق، ص٢٤٨;م.ر.هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی دووەم، جاف پرێس، لەندەن، ١٩٩٠.، ل ل ٦٢-٦٣.

٣١. بۆزانیاری زیاتر دەربارەی چۆنیەتی هەڵبژاردنی شا فەیسەڵ لەلایەن بەریتانیا لەسەر تەختی پاشایەتی عێراق، بڕوانە، احمد رفيق البرقاوي: العلاقات السياسية بين العراق و بريطانيا (١٩٢٢-١٩٣٢)، بغداد، ١٩٨٠، ص ص٢٥-٣٢

٣٢. لە ڕاستیدا ئەو لیژنە سیاسییەی کە ئەم یادداشتەی پێشکەش کرابوو، پێکهاتبوون لە ونستۆن چەرچڵ وەك سەرۆك و ئەندامێتی هەریەك لە پیرسی کۆکس و مس بیل، لورانسی عەرەب، مێجەر یۆنگ، مێجەر نۆئیل وەك ئەندامی ڕاوێژکاری، بڕوانە، جرجيس فتح الله: يقظة الكرد...، ص ص ٢٣٦-٢٣٧.

٣٣. المصدر نفسه، ص ٢٣٧.

٣٤. المصدر نفسه، ص ٢٣٧.

٣٥. كمال مظهر احمد: كركوك وتوابعها...، ص١٢١.

٣٦. نوري عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ص ٤٧-٤٨.

٣٧. جرجيس فتح الله: النفط قرر مصير كوردستان...،

ص١٦.
٣٨. نوري عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ٤٨.
٣٩. عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات العراقية،...، ج١، ط٢، ص٢٧٩؛ بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی گفتوگۆکانی نێوان بەریتانیا و دەسەلاتدارانی عێراق لەسەر پەیمانی بەریتانی-عێراقی ساڵی ١٩٢٢، بڕوانە، فاروق صالح العمر: المعاهدات العراقية-البريطانية وأثرها في السياسة الداخلية ١٩٢٢-١٩٤٨، بغداد، ١٩٧٧، ص ص ٢٧-٦٠.
٤٠. نوري عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ٦٦.
٤١. سليم طه تكريتي: معركة النفط في العراق،...، ص٧٤.
٤٢. نوري عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ص٦٧-٦٨.
٤٣. المصدر نفسه، ص ٦٨.
٤٤. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ناوەرۆکی نامەیەی وەزیری دارایی عێراق، بڕوانە، قاسم احمد العباس:المصدر السابق، ص ١٧٦
٤٥. نوري عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ٦٩.
٤٦. المصدر نفسه، ص ٥٥.
٤٧. فاضل حسين: المصدر السابق، ص ص ٢٥-٢٦.
٤٨. Daniel Yergin: The Prize: The Epic Quest for oil, money & power, (Published by Simon&Schuster- New York), ١٩٩٢, ،p.١٩٦.
٤٩. Ibid ،p.١٩٦.
٥٠. William Stivers: International Politics and Iraq Oil, (١٩١٨-١٩٢٨), A study in Anglo-American Diplomacy, Harvard College, The Business History Review, Vol. ٥٥, No. ٤ (Winter, ١٩٨١).p.٥٢٤.
٥١. Ibid ،p.٥٢٤.
٥٢. Daniel Yergin: op .cit, p.١٩٦.
٥٣. Ibid ،p. ١٩٦.
٥٤. وارین هاردینگ (Warren Harding) وەك سەرۆك كۆماری نوێی ئەمریكا دەستبەكاربوو لە جێگای وودرو ویلسون، لەسەردەمی ئەم سەرۆكەدا بارودۆخی نەوت زۆر چووە پێش بەجۆرێك حكومەتی تازە لە حكومەتەكانی پێش خۆی چالاكتر كەوتە بەرگریكردن لە بەرژەوەندییە نەوتییەكانی ئەمریكا، هەر لە مەكسیكەوە تاكو هێندی رۆژهەلات و میزۆپۆتامیا، بڕوانە،p.١٩٦. ،Ibid.
٥٥. John A.Denovo: American Interests and Policies in the Middle East ١٩٠٠-١٩٣٩, University of Minnesota Press Minneapolis, (United States-١٩٦٣), p.١٨٤; Benjamin Shwadran: The Middle East, Oil and the Great Powers, (Frederick A. Pracger -New York), ١٩٥٥، p.٢١٥; Daniel Yergin: op. cit, p.١٩٦.
٥٦. دور احتكار النفط الدولي في العراق(وهو الفصل الرابع من تقرير لجنة التجارة الاتحادية الاميركية عن احتكار النفط الدولي)، مطبعة الرابطة، بغداد، ١٩٦٠، .، ص ١٤ ;Benjamin Shwadran: op.cit, p.٢١٥
٥٧. ابراهيم علاوي: البترول العراقي والتحرر الوطني، دار الطليعة، بيروت، ١٩٦٧، ص٥٦.
٥٨. د.ك.و، ملفات الاستثمارات النفطية في العراق و حصة بريطانيا، رقم الملف (٣١٠)، (Confidential Memorandum to be Returned to The Colonial Office in ١٩٢٧)، و٤، ص ص١٦-١٧.
٥٩. S.H.Longrigg:Oil in the Middle East, oxfort, Oxford University Press, (London, ١٩٥٥), p.٤٦; William Stivers:op ،cit ،p.٥١٨; اندره نۆسشي: المصدر السابق، ص٧٨.
٦٠. William Stivers: op. cit، p.٥١٨.
٦١. Ibid، p. ٥٢٤.
٦٢. نوري عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ٥٦.
٦٣. د.ك.و، ملفات الاستثمارات النفطية في العراق و حصة بريطانيا، رقم الملف (٣١٠)، (Confidential Memorandum to be Returned to The Colonial Office in ١٩٢٧)، و٤، ص١٧.
٦٤. John A.Denovo: op.cit، p.١٩٠.
٦٥. دور احتكار النفط الدولي في العراق...، المصدر السابق، ص ١٥.
٦٦. John A.Denovo: op.cit، p.١٩٠; نوری عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ٥٧.
٦٧. نوری عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ٥٧.
٦٨. دور احتكار النفط الدولي في العراق...، المصدر السابق، ص ١٨.
٦٩. والتەر تیگەل سەرمایەدارێكی دیاری پیشەسازی نەوتی ئەمریكا بوو، بۆچوونەكانی دەربارەی نەوتی میزۆپۆتامیا بەم شێوەیە روون بۆتەوە كاتێك لە ساڵی ١٩٢٠ هاوكات لەگەڵ پێنجەمین ساڵ رۆژی پێكهێنانی ستاندرد نیوجیرسیدا تێكەڵ ستراتیژی نوێی خۆی بەو شێوەیە راگەیاند:" سیاسەتی ئێستای ستاندرد نیوجرسی ئۆیل ئەوەیە، كە بێ ئەوەی گوێ بەوە بدرێ لەكام ولاتدایە، بایەخ بەهەموو مەیدانێكی بەرهەمهێنان نەوت بدرێت، ستاندرد نیوجیرسی بەنیازە لە هەموو خاڵێكی جیهان، كە ئەگەری بوونی نەوتی لێبكرێت ئامادەیە، بڕوانە، Daniel Yergin:op.cit, p.١٩٩.
٧٠. كۆنسۆرسیومی پێكهاتبوو لەم كۆمپانیایانەدا: اتلانتك ریفاینك(Atlantic Refining)و كۆمپانیای گولف ریفاینك (Gulf Refining) و كۆمپانیای نەوتی مەكسیك(Mexican Petroleum) و كۆمپانیای نەوتی سینكلر (Sinclair Gonsolidated Oil) و كۆمپانیای ستاندر ئۆیل ئۆڤ نیوجرسی و كۆمپانیای تكساس ئۆیل(Texas Oil) و كۆمپانیای سۆكۆنی موبیل(Socony Mobil)، بڕوانە، قاسم احمد العباس، المصدر السابق، ج١، ص١٠٠.
٧١. Daniel Yergin:op .cit, p.١٩٧.
٧٢. Benjamin Shwadran: op.cit, p.٢١٦.
٧٣. نوري عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ٥٨.

Benjamin Shwadran: op.cit. p.٢١٦. ٧٤.

٧٥. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، فؤاد حمه خورشيد: القضية الكردية في المؤتمرات الدولية...، ص ص٦٥-٧٠.

٧٦. فاضل حسين: المصدر السابق، ص٢٩.

٧٧. وليد حمدي: المصدر السابق، ص٣٢.

٧٨. John A.Denovo: op. cit ،p.١٩١.

٧٩. جرجيس فتح الله: النفط قرر مصير كوردستان...، ص١٦؛ ئەو ئاماژانەی زیاتر ڕوونە کە کۆنگرەی لۆزان گرنگی زیاتری داوە بە پرسی نەوت لە کێشەکانی تر. ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتی بەناوبانگی بواری نەوت بەشدار بوون و ئامادەیەکی بەردەوامیان هەبوو لە دانیشتەنەکانی کۆنگرەدا بۆ ئەوەی پرس ورایان لێوەربگیردرێت وەك ڕاوێژکاری بواری، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، عبدالحميد العلوجي وخضير اللامي:المصدر السابق، ج١، ص٢٨٩؛ ئازاد نەقشبەندی: کێشەی موسڵ یان کێشەی نەوت، گۆڤاری مەتین، ژمارە(٥٧)، ١٩٩٦، ل ل١٤-١٥.

٨٠. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ناوەرۆکی ئەم ڕاپۆرتە بە زمانی عەرەبی، بڕوانە، نوري عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ٥٩.

٨١. Petroleum affairs ،in. R.O.I ،Vol ،١٩٢٤-١٩٢٣ p. ٤١٤.

٨٢. Edward Ingram: National and International Politics in the Middle East ،First Published، Great Britian١٩٨٦ ،. p. ١٥٨.

٨٣. نوري عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ٦٠؛ ئەوەی شایەنی باس بێت ئیتالییەکان داوای پشکیان دەکرد لە نەوت، چونکە یەکێك بوونە لە هاوپەیمانان وبەشداریان کردەوە لە سەرکەوتنەکان لە جەنگی جیهانیدا، هیچ دەستکەوتێکیان پێنەدراوە لە ڕێککەوتنی سان_ریمۆ، ئیتالییەکان لە کاتی مۆرکردنی سان_ریمۆ لەنێوان بەریتانیا وفەرەنسا ئەم ڕێککەوتنەیان ڕەتکردەوە، ڕایانگەیاند کە ئەم ڕێککەوتنە تەنها دژ بە خاڵەکانی کۆمەڵەی گەلان نیە، بەڵکو هەڕەشەیەکی توندە بۆ سەر دابینکردنی سەرچاوەکانی پترۆل بۆ ئیتالیا، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە،
Edward Ingram: National and International Politics in the Middle East. First Published. Great Britian. ١٩٨٦. ،pp. ١٤٩-١٤٨

٨٤. Petroleum affairs ،in. R.O.I ،Vol ،١٩٢٤-١٩٢٣ p. ٤١٤.

Benjamin Shwadran: op.cit. p.٢١٦. ٨٥.

٨٦. نوري عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ٦٠؛ بەڵام بە هۆی سەرنەکەوتنی کۆنگرەی لۆزان و نەگەیشتنی بە ڕێککەوتنێك و چارەسەرێك بۆ کێشە سنوورییەکانی نێوان تورکیا_عێراق لەسەر ویلایەتی موسڵ، ئەم جۆرە قوربانیە لەلایەن حکومەتی عێراق نەدرا، هەروەها ڕازینەبوون لە سەری، ئەم جۆرە گفتوگۆیانە لەسەر پشکی حکومەتی عێراق درێژەی دەبێت، تاکو ساڵی ١٩٢٥ لەنێوان حکومەتی عێراق و کۆمپانیای نەوتی تورکی، بڕوانە، جرجيس فتح الله: النفط قرر مصير كوردستان...، ص٢٠.

٨٧. بيتر جي.لامبرت: الولايات المتحدة والكورد(دراسة حالات عن تعهدات الولايات المتحدة)، مركز الدراسات الكوردية وحفظ الوثائق_جامعة دهوك، دهوك، ٢٠٠٨، ص٣٩؛ Benjamin Shwadran: op.cit. p.٢٢٠

٨٨. فاضل حسين: المصدر السابق، ص٢٨٤.

٨٩. المصدر نفسه، ص ٢٨٥.

٩٠. John A.Denovo: op.cit ،p.١٩١.

ئەوەی شایەنی باس بێت گرووپی چێستەر چەند جارێ بانگهێشت کرابوو بۆ تورکیا بۆ ئەوەی گفتوگۆ بکات دەربارەی ئەم پرۆژەیە، گرنگی ئەم پرۆژەیە لە ڕوانگەی ئەمریکاییەکان خۆی لەو پرسیارەدا دەبینێتەوە، کە( ئەگەر موسڵ گەڕایەوە بۆ تورکیا)، هەروەها تورکەکان زۆر گرنگیان بەم پرۆژەیە دەدا، چونکە هەمان مەبەستیان هەبوو ئەگەر ویلایەتی موسڵ گەڕایەوە بۆ تورکیا چۆن وەبەرهێنان لە بواری نەوت لەم ناوچانە بکرێت، بۆیە تورکەکان زۆر بەخۆشحاڵیەوە لە حوزەیرانی ١٩٢٠، جارێکی تر لە ساڵی ١٩٢١ ئەم گرووپە بانگهێشت کرا بۆ تورکیا بۆ هەمان مەبەست، لە ساڵی ١٩٢٢ گرنگی بەهێز بە پرۆژەی چێستەر لە ئەمریکا و کەندا دەدرا، لە هەمان ساڵدا، کۆمپانیای پەرەپێدانی عوسمانی-ئەمریکی ڕێکخرایەوە، نوێنەرانی کۆمپانیا سەردانی تورکیایان کرد و گفتوگۆیان لەگەڵ وەزیری ئەشغاڵ لە ئەنقەرە کردبوو بۆ نوێ بوونەوەی ئیمتیازی چێستەری پێش جەنگی جیهانی، بڕوانە، Benjamin Shwadran: op.cit. p.٢٢٠.

p.١٩١. ،٩١. John A.Denovo: op.cit

٩٢. ئەم گرووپە لە میراتگرانەی کۆمەڵێك کۆمپانیای بەریتانی لەپشتەوە بوو زۆر بە توندی داوای ئیمتیازی ئەم ناوچانەیان دەکرد، سەرچاوەیەکیش ئاماژە دەکات، کە وەزارەتی داگیرگەکان بەریتانیا پێشوازی لەم جۆرە گرووپە دەکرد، چونکە بە مەزەندەی بەریتانیا ئەڵتەرناتیڤێکی نوێ، ئەگەر هاتوو شەرعیەتی داواکاری کۆمپانیای نەوتی تورکی نەچەسپا، بڕوانە، نوري عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ٦١.

٩٣. John A.Denovo: op.cit ،p.١٩٢; Benjamin Shwadran: op.cit. p.٢٢١.

٩٤. Benjamimn Shwadran: op.cit. p.٢٢٢

٩٥. هنري فوستر: نشأة العراق الحديث، ت/سليم طه التكريتي، ج١، ط١، الفجر للنشر والتوزيع، بغداد، ١٩٨٩، ص٢٤٠.

٩٦. فاضل حسين: المصدر السابق، ص٢٨٨.

٩٧. Benjamin Shwadran: op.cit. p.٢٢٣

٩٨.Benjamin Shwadran:op.cit. p.٢٢٣; بيار مصطفى سيف الدين:المصدر السابق، ص١٠٧

٩٩. عبدالحميد العلوجي وخضير اللامي:المصدر السابق، ج٢، ص ص ١٧-١٨.

١٠٠. نوري عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ٦٢.

١٠١. جرجيس فتح الله: النفط قرر مصير كوردستان...، ص

ص ١٧-١٨.

١٠٢. Benjamin Shwadran: op.cit, p.٢٢٤.

١٠٣.Elizabeth Monroe: Britain's Moment in the Middle East ١٩٥٦-١٩١٤, John Hopkins Press, (Baltimore, London-١٩٦٣), p.١٠٢.

١٠٤. فاضل حسين: المصدر السابق، ص٢٨٦.

١٠٥. المصدر نفسه، ص ص٢٨٦-٢٨٧.

١٠٦. المصدر نفسه، ص٢٨٧.

١٠٧. عبدالحميد العلوجي واللامي:المصدر السابق، ج١، ص ٢٩٤;کامەران ئەحمەد محەمەد:سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٢.

١٠٨. جەمال خەزنەدار: رۆژی کوردستان(١٩٢٢-١٩٢٣)، بەغدا، ١٩٧٣، ل ل٣٧-٣٨.

١٠٩. هنري فوستر: المصدر السابق، ص٢٤٠.

١١٠. کامەران ئەحمەد محەمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٢.

١١١. Lawrence Martin: The Chester Concession. Materials and Foodstuffs in the Commercial Policies of Nations, Sage Publications, Inc., Annals of the American Academy of Political and Social Science, Vol. ١١٢, Raw Materials and Foodstuffs in the Commercial Policies of Nations (Mar., ١٩٢٤) ،p.١٨٨; Benjamin Shwadran: op.cit, p.٢٢٢.

١١٢. هنري فوستر:المصدر السابق، ص٢٤٢; نوري عبد الحميد خليل:المصدر السابق، ص ٦٢.

١١٣. John A.Denovo: op.cit ،p.١٩٤.

١١٤. Benjamin Shwadran: op.cit, p.٢٢٢.

١١٥. فاضل حسين: المصدر السابق، ص٣١٢; دوای ئەوەی کۆمپانیای پەرەپێدانی عوسمانی-ئەمریکی سەرکەوتوو نەبوولە پاڵپشتی ئەمریکا بۆ پرۆژەکەی، کێشەی موسڵ چارەسەری بۆ نەدۆزرایەوە لە لۆزان، حکومەتی تورکیا لە١٨کانوونی یەکەمی ١٩٢٣ ئیمتیازی چێستەری هەڵوەشاندەوە، بڕوانە، Benjamin Shwadran: op.cit p.٢٢٣.

١١٦. قاسم احمد العباس:المصدر السابق، ج١، ص ص ٧٣-٧٦.

١١٧. نوري عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ٦٣.

١١٨. دور احتكار النفط الدولي في العراق...، المصدر السابق، ص ص ٢٧-٢٨.

١١٩. نوري عبد الحميد خليل: المصدر السابق، ص ٦٤; لەو راپۆرتانەی لە ١٢ نیسانی ١٩٢٣ دەربارەی کۆمپانیای نەوتی تورکی دەست کەوتوو، ئاماژەدەکات بەوەی حکومەتی بەریتانیا دەسەڵاتی رەهای لەسەر کۆمپانیادا هەبوو، چونکە بەشداربووانی کۆمپانیا، کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ-فارسی بوو نزیکەی ٧٦٠٠٠ سەهمی هەبوو، هەروەها بەریتانییەکان دەستیان بەسەر سەهمەکانی ئەڵمانیاش گرتبوو کە نزیکەی ٤٠٠٠٠ سەهم بوو، بۆیە لە کۆی گشتی سەهمەکانی کۆمپانیای نەوتی تورکی کە نزیکەی ١٦٠٠٠٠ سەهم بوو بەریتانیا بەتەنها ١١٦٠٠٠ سەهمی لە ژێر دەستدا بوو، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

Stanley K. Hornbeck, Edward Grigg: op.cit, p..١٦٠

١٢٠. Petroleum affairs ،in, R.O.I ،Vol ٣ -١٩٢٣ ،١٩٢٤pp. ٤٢٨-٤٢٧.

١٢١. Benjamin Shwadran: op.cit, p.٢٢٦.

١٢٢. Ibid ،p.٢٢٦.

١٢٣. Petroleum affairs ،in, R.O.I ،Vol ٣ -١٩٢٣ ،١٩٢٤p. ٤١١.

١٢٤. Benjamin Shwadran: op.cit, p.٢٢٦.

١٢٥. Benjamin Shwadran:op.cit ،p.٢٢٧;Stanley K. Hornbeck ،Edward Grigg:op.cit ،p.١١٧.

١٢٦. اندره نۆسشي: المصدر السابق، ص٨٠.

١٢٧. المصدر نفسه، ص ص١٣٢-١٣٣;عبدالحميد العلوجي واللامي:المصدر السابق، ج٢، ص ١٠٧.

١٢٨. اندره نۆسشي: المصدر السابق، ص٨١.

١٢٩. Benjamin Shwadran: op.cit, p.٢٢٧.

١٣٠. John A.Denovo: op.cit ،p.١٩٥.

١٣١. بيتر جي.لامبرت: المصدر السابق، ص ص ٤١-٤٢.

١٣٢.Petroleum affairs ،in, R.O.I ،Vol ٣ -١٩٢٣ ،١٩٢٤ p. ٤٢٧.

١٣٣. هاوار: موقف الحكومة البريطانية ازاء احداث كردستان في العشرينات ودور(عصبة الأمم)، مجلة الثقافة الكردية، العدد (٣)شباط١٩٩٢، ص٨.

*** نەوتی کەرکوك لە بازنەی کێشەی ویلایەتی موسڵ و وتووێژەکانی حکومەتی عێراقیدا (١٩٢٤-١٩٢٦)**

**د. دڵشاد عومەر عەبدولعەزیز**

ئەگەر چی زلهێزەکان لە ململانێی دابوون بۆ دەستکەوتنی ئیمتیازی نەوتی ویلایەتی موسڵ لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی ودژ بە ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی (TPC) بوون لەسەر ویلایەتی موسڵ و بەغدا، چەندین خاڵی ناکۆکی لەنێوانیاندا هەبوو، بە تایبەتی تا شەرعیەتی ئەو ئیمتیازەی کۆمپانیای (TPC). بەریتانیا بەردەوام جەختیان لەسەری دەکردەوە، کە سەدری ئەعزەمی عوسمانی لە (٢٨) ی حوزەیرانی ساڵی (١٩١٤) بەڵێنی ئیمتیازی داوە پێیان لە هەردوو ویلایەتدا، لەگەڵ ئەوەی ئەمریکییەکان هەڵوێستی تریان هەبوو، کە بەردەوام داوای جێبەجێکردنی سیاسەتی (دەرگای کراوە) یان دەکرد لە بەشداریکردنی هەمووان بۆ پەرەپێدانی نەوت لەم ناوچانەدا، بەپێی سیاسەتی دەرگای کراوە، بەڵام لە ژێر کاریگەری کۆنگرەی لۆزاندا، جارێکی تر لە نیسانی ساڵی (١٩٢٣) گفتوگۆکان دەستی پێکرد لەنێوان کۆمپانیا نەوتییەکانی زلهێزەکان بۆ بەشداریکردن لە کۆمپانیای (TPC) بۆ پەرەپێدانی نەوتی ویلایەتی موسڵ وبە تایبەتی نەوتی کەرکوك. لە (١٢)ی نیسانی ساڵی (١٩٢٣) هەر چوار گرووپی (گرووپی دارسی، گرووپی فەرەنسی، کۆمپانی رۆیاڵ دۆچ شیل وکۆلبنگیان)، کە چاویان بڕیبووە کۆمپانیای نەوتی تورکی، گەیشتنە ڕێککەوتنێکی سەرەتایی لەگەڵ گرووپی ئەمریکی، بەوەی کە کۆمپانیا بە زووترین کات دەست بە گفتوگۆ بکات لەگەڵ حکومەتی عێراقی، بۆ گەیشتن بە ڕێککەوتنێك، کە مافی بەخشینی کۆمپانیای (TPC) لە پەرەپێدان و بەکارخستنی کێڵگە نەوتییەکانی ویلایەتی موسڵ وبەغدا، لە ژێر سەروەری دەوڵەتی عێراقدا مسۆگەرکەن[١].

کۆمپانیای نەوتی تورکی لەلایەن خۆیەوە بۆ ئەم مەبەستە رەشنووسی ڕێککەوتنێکی ئامادەکردبوو، کە پێکهاتبوو لە (٤٠ برگە)، ئەم رەشنووسە ناسراوە بە رەشنووسی ڕێککەوتنی (١٥)ی مایسی ساڵی (١٩٢٣)، لە گرنگترین ئەو خاڵانەی تێیدا هاتبوو:

کۆمپانیای نەوتی تورکی بەپێی یاساکانی بەریتانیا دامەزراوە، لە لەندەن تۆمارکراوە، کارەکانی تەنها لە بواری نەوت دایە، خوازیاری ئیمتیازی نەوتە لە سنوورەکانی ویلایەتی موسڵ وبەغدا وبەسرە بۆ ماوەی ٩٩ ساڵ، ئەمە لەگەڵ نەخشەیەکی رەنگاو رەنگ بۆ ناوچەکانی ئیمتیاز بۆ تەواوکردنی کارەکانی ئامادەکردبوو[٢].

هەرچەند کۆمپانیای (TPC) رەشنووسی ڕێککەوتنەکەی خستەوە بەردەم حکومەتی عێراقی و مەندووبی سامی بەریتانیا لە عێراق، بەڵام بۆردیلۆن سکرتارییەتی مەندووبی سامی (B.H. Bourdillon) لە بەرواری (٨)ی ئابی ساڵی (١٩٢٣) نوسراوێکی نهێنی بە ژمارەی (P.O-٧٥) ئاراستەی سەرۆك وەزیران (عەبدولمحسن سەعدون) دەکات، کە لە ناوەرۆکی دا هاتووە: "حکومەتی بەریتانیا باوەری تەواوی بە شەرعیەتی ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی هەیە، کە لەلایەن حکومەتی تورکی لە ساڵی (١٩١٤) پێی بەخشراوە، بۆیە نابێت حکومەتی عێراق خۆی بدزێتەوە لەم راستییە، بە تایبەتی کە کۆمپانیا هەوڵی کۆبوونەوی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا وفەرەنسا و سەندیکاکانی بەریتانیا و هۆڵەندای داوە بۆ کۆکردنەوەی سەرمایەیەکی گەورە، تا کۆمپانیاکە بکاتە بەهێزترین کۆمپانیا لە جیهاندا، ئەم هەوڵانەی کۆمپانیاش بۆ پەرەپێدانی نەوتی عێراقییە، کۆمپانیا ئامادەیە دەست بەکاربێت، لەگەڵ ئەوەی وەزارەتی داگیرگەکان پێشنیازی کردەوە بە دەست پێکردنی گفتوگۆی سەرەتایی وەك ئەوەی لە زەوییە گواستراوەکان (خانەقین) ئەنجام دراوە، حکومەتی بەریتانیا ئامادەیی خۆی نیشان دەدات بۆ پێشکەشکردنی هەر خزمەتگوزارییەك کە عێراق پێویستی پێی بێ، ئەگەر ئەم پێشنیازەتان قبوڵ کرد، ئەوا بە باشی دەزانین بەرێز ساسۆن حسقێل[٣] وەك نوێنەری خۆتان بۆ گفتوگۆ رەوانەبکەن، ..."[٤].

سەبارەت بە داواکارییەکانی کۆمپانیای (TPC) راوێژکاری یاسایی عێراقی حکومەتی لەوە ئاگادار کرد بووەوە، کە (TPC) هیچ مافێکی ئیمتیازی نەوتی لە عێراقدا نەماوە، چونکە ئەو ماوەیەی حکومەتی عێراقی بۆی تەرخانکردبوو لە خستنەڕووی بەڵگەکانی، کە مافی ئیمتیازی پێی بەخشراوە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی بەسەرچوو[٥]" بەڵام لە وەڵامی ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق لە (١٣)ی ئابی ساڵی (١٩٢٣) بەدوو برگە هاتبوو، یەکەمیان ئاماژەدەکات بەوەی حکومەتی عێراق هیچ دان نانێت بەو ئیمتیازەی (TPC) خستویەتییەروو، دووەمیان رەزامەندە بەوەی دەسەڵات بە ساسۆن حسقێل بدات لە لەندەن بۆ دەست پێکردنی گفتوگۆکان لەگەڵ (TPC)، کە خوازیاری دەستکەوتنی ئیمتیازی نەوتی عێراقە[٦].

*** وتووێژەکانی نێوان (TPC) و حکومەتی عێراق لە پێناو ئیمتیازی نەوتدا:**

ئەنجامی گفتوگۆکانی نێوان حکومەتی عێراق ونوێنەری کۆمپانیای (TPC) لە لەندەن، لە (٣٠)ی ئابی ساڵی (١٩٢٣) دا لە رێگای مەندووبی سامییەوە خرانە بەردەم ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراقی[٧] حکومەتی عێراقی چەندین لیژنەی پێکهێنا بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر پێشنیازەکان، بەڵام بێ ئەنجام بوو. لە لەندەن دوو دانیشتنی لە (٧) و (١٠) ی ئەیلولی ساڵی (١٩٢٣) کرا بۆ تاوتوێکردنی پرۆژەی ڕێککەوتن وپێشنیازەکانی حکومەتی عێراقی، دانیشتنەکان بە ئامادەبوونی ساسۆن حسقیل و راوێژکاری یاسایی مەندووبی سامی (N.Davidson) و نوێنەری کۆمپانیای نەوتی تورکی ئەدوارد هەربت کیلینگ[٨] (E.G Keeling) و لەلایەن وەزارەتی داگیرگەکان مێجەر یۆنگ ومستر کلوسن ومستر کلارك لە دەزگای نەوت لە وەزارەتی داگیرگەکان ئەنجام دران[٩] گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە پێشنیازەکانی

لیژنەی عێراقی هاوشێوەی پێشنیازەکانی کۆمپانیایە، بۆیە داواکرا درێژە بە گفتوگۆکان بدرێت، تاکو کۆمپانیای نەوتی تورکی دەگاتە رێککەوتنێك لەگەڵ گرووپی ئەمریکی لەسەر پشکەکان. گفتوگۆکان لە (٢٦)ی حوزیرانی ساڵی (١٩٢٣) بەردەوام بوو، تاکو ناوەراستی مانگی ئەیلولی ساڵی (١٩٢٣)، لە گرنگترین پێشنیازەکانی ساسۆن حسقێل بریتی بوو لە:

(ماوەی ئیمتیاز کەمبکرێتەوە لە ٩٩ ساڵ بۆ ٣٠ ساڵ، ئیمتیازی ویلایەتی بەسرا نەگرێتەوە، لەگەڵ ئەوەی حکومەتی عێراق داوای دەکرد کۆمپانیاکە لە عێراقدا تۆماربکرێت، هەروەها عێراق داوای ٢٠٪ پشکی کۆمپانیای کرد لەگەڵ مافی نوێنەرێك لە ئەنجوومەنی کۆمپانیا) [١٠].

کۆمپانیای نەوتی تورکی بڕیاریدا بەوەی چاو بە پێشنیازەکانی حکومەتی عێراقی بخشێنێتەوە و یەکسەر داوای لە حکومەتی عێراق کرد بۆ ئەوەی نوێنەری کۆمپانیا بێت بۆ بەغدا بۆ درێژەپێدانی گفتوگۆکان، هەروەها حکومەتی عێراقی بەپێی دانیشتنێکی ئەنجوومەنی وەزیران لە (١٩)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٢٣) رەزامەندی دەربڕی لەسەر گفتوگۆکردن لەگەڵ نوێنەری (TPC) [١١].

بە گەیشتنی نوێنەری کۆمپانیا (کیلینگ) بۆ بەغدا، لە (٢٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٣) دا راستەوخۆ وتووێژی نێوان حکومەتی عێراقی و کۆمپانیای (TPC) کە سەبارەت بە دانانی مەرجەکانی ئیمتیاز بوو دەستی پێیکرد[١٢] بە هاتنی ئەم کەسایەتییە ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقی لیژنەیێك پێکدەهێنێت لە وەزیری دارایی (ساسۆن حسقێل) و وەزیری داد (ناجی سویدی) و وەزیری گواستنەوە وئەشغال (یاسین هاشمی) بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ نوێنەری کۆمپانیاکە[١٣] نوێنەری کۆمپانیا زۆر لێهاتوو تر بوو و زانیاری تەواوی هەبوو دەربارەی گرنگی نەوت لەگەڵ خۆیدا چەندین پسپۆری لێهاتووی نەوت و دارایی و یاسایی لە جیهاندا هێنابوو، بەڵام شاندی عێراقی جگە لە ساسۆن حسقێل، کەسێکی تێدا نەبوو کە سەروەدەری لە گرنگی گفتوگۆکردن لەسەر کەرەستەی نەوت هەبێ[١٤].

لە (٢٠)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٣) بە گەیشتنی کیلینگ کۆمپانیا پرۆژەیەکی (٣٨ برگەی) نوێی پێشکەشکرد، کە چەندین گۆرانکاری و هەمواركردنی نوێی تێدابوو لەسەر پرۆژەی رێککەوتنی (١٥)ی ئاياری ساڵی (١٩٢٣) لە ژێر رۆشنایی گفتوگۆکانی لەندەن[١٥].

لە گفتوگۆکاندا ئەوە بەدی دەکرا، کە ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراقی بەلای ئەوەدا دەرۆیشت، کە پەسندکردنی رازیبوونی ئیمتیازی بگوازێتەوە بۆ ئەنجوومەنی تانسیسی، بەڵام کیلینگ داوای لە وەزیرەکان کرد، کە دەسەڵاتی خۆیان بەکاربهێنن بەبێ هیچ بەربەستێك، ئاگاداری کردنەوە لە ئەگەری هاتنی حکومەتێکی نوێ، کە هیچ پابەند نەبێت بەم ئیمتیازەوە، داوای کرد مەرجەکان قورس نەکەن لەسەر کۆمپانیا بۆ ئەوەی بتوانێت سەرمایەی پێویست کۆبکاتەوە، هەروەها ماوەی ٩٩ ساڵ بدرێت بە ئیمتیاز، ویلایەتی بەسرەشی پێبدرێت، داوای کرد قەناعەت بە حکومەتی عێراق بهێنێت بەوەی رازیبێت بە (٤شلن) [١٦] بۆ هەر تەنێك لە نەوتی بەرهەمهێنراو لە جێگایی بەشداریکردن لە پشکەکانی کۆمپانیا، لەگەڵ ئەوەی کیلینگ رەتی کردبووە بە تۆمارکردنی کۆمپانیا لە عێراق، بەو بیانوەی کە سەرمایەدارەکانی بەشداربووی کۆمپانیا خوازیارن لە ژێر پارێزگاری یاساکانی بەریتانیا بمێننەوە[١٧].

ئەوەی زیاتر بەدی دەکرا کۆمپانیای (TPC) بەردەوام دەیویست مەرجەکانی خۆی بەسەر لایەنی عێراقیدا بسەپێنێت، هەرچەندە بە هۆی دەست لە کارکێشانەوەی حکومەت چەندین جار لیژنەی گفتوگۆی عێراقی گۆرانکاری بەسەر دەهات، بەڵام لەسەر بیروبۆچوونەکانی خۆیان هەر بەردەوام بوون[١٨] بەشی فەرمانگەی نەوت لە وەزارەتی داگیرگەکان ئەم ناکۆکییەی نێوان عێراقییەکان و (TPC) دەگەرێنێتەوە بۆ کەم ئەزموونی گفتوگۆکەرانی عێراقی لە بواری نەوتدا، بۆیە فەرمانگەی نەوت و وەزارەتی داگیرگەکان ناچار بوون دەست وەردەنە ناو گفتوگۆکان لە رێگای مەندووبی سامی بەریتانیا لە عێراق[١٩] ئەوە بوو لە (٨)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٢٣) دا مەندووبی سامی هێنری دۆبس ئامۆژگاری شا فەیسەڵ دەکات بە قبووڵکردنی پێشنیازەکانی کیلینگ بە بێ هیچ هەموارکردنێك، چونکە ئەمە لە بەرژەوەندی عێراق دایە[٢٠] هەروەها لە رێگای خۆیەوە شا فەیسەڵ بە سەرۆکی لیژنەی گفتوگۆکەری عێراقی (عەلی جەودەت ئەیوبی) راگەیاند: "کە ئینگلیزەکان رازی نابن لەوەی زیاتر لە (٤شلن) بۆ عێراق تەرخان بکەن، هەروەها هەرەشەی ئەوەیان کرد، کە رێگای تر بۆ پارێزگاری لە مافی کۆمپانیای (TPC) دەگرنەبەر، بەتایبەت تورکەکان ئامادەن بۆ خستنەرووی ئاسانکاری بۆ ئەم کێشەیە...، هەروەها کێشەی مووسڵ و سنوورەکانی تاکو ئێستا چارەسەر نەکراوە"[٢١].

لەلایەکی ترەوە وەزیری بەرگری عێراق (نوری سەعید) لە (١٠)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٤) لە رۆژنامەی (استقلال)، بەباشی دەزانی حکومەتی عێراقی رەزامەندبێت بەبەخشینی ئیمتیازی نەوت بە کۆمپانیای نەوتی تورکی بە مەرجی پێدانی کۆمپانیا هەموو پێداویستەکانی عێراق لە نەوت بە نرخێکی گونجاو، ئاماژەدەکات بەوەی ئەم رێگایە باشترەو قازانجی زیاترە لەوەی بەشداربێت لە کۆمپانیا[٢٢] راوێژکاری وەزارەتی دارایی عێراق (سلیتر)، کە هەر لەسەرەتاوە رۆڵێکی گرنگی بینیبوو لەوەی قەناعەت بە لایەنی عێراقی بکات، بۆ ئەوەی دەستهەڵگرن لە بەشداریکرن لە کۆمپانیادا[٢٣].

لە ئەنجامی ئەم فشارانە لەسەر لیژنەی گفتوگۆی وەزیران کرا بۆ دەستهەڵگرتن لە داواکاری بەشداریکردنی کۆمپانیا، لیژنە بە نوێنەری کۆمپانیای نەوتی تورکی راگەیاند، کە ئامادەیە بەوەی پێشنیاز بکات بۆ ئەنجوومەنی وەزیران، کە رازیبێت لەسەر (٤شلن)، بەڵام بە مەرجێك کۆمپانیا بەڵێن بدات بە فرۆشتنی هەموو پێداویستەکانی ناوخۆی عێراق لە نەوت، بەنرخی تێچوون، لەگەڵ کرێی گواستنەوە وپاڵاوتن، ئامادەی خۆی نیشاندا بەوەی ویلایەتی بەسرە بخاتە ناو سنووری ئیمتیازی کۆمپانیاکەوە، ماوەی ئیمتیازیش بکاتە

(٩٩) ساڵ[٢٤].

به پێی ئەو نووسراوەی وەزارەتی داد (عدلیه) له بەرواری (٢١)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٤) به ژمارەی (ا.ج، ٩/١٤٥/١) ئاراستەی وەزارەتی دارایی کردووه لەسەر هەردوو برگەی (٣٧، ٣٦) [٢٥] له ڕەشنووسی ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکیدا، ئەوه دەردەکەوێت، که چەندین برگه لەنێوان لیژنەی وەزیرانی عێراقی و نوێنەری کۆمپانیای نەوتی تورکی جێناکۆك و چارەسەر نەکراوە، لەو برگانەش (٢، ٣، ٦، ١٠، ١١، ١٢، ١٣، ١٤، ١٥، ١٦، ١٧، ١٨، ٢١، ٣١، ٣٢، ٣٣، ٣٧) [٢٦].

له (١٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٤) هەردوو لایەن، حکومەتی عێراقی و کۆمپانیای نەوتی تورکی بەیانێکیان ئامادەکردبوو بۆ ڕۆژنامەکان، که مەرجەکانی ئیمتیازی نەوتی تێدابوو، ئەوەی خستبەووه ڕوو، که بڕی (٤شلن) زۆر باشتره لەوەی بدرێت به حکومەتێکی تر، هەروەك ئاماژه بەوەش دەکات که هەندێك مەرجی ئیمتیاز زۆر قوورسه لەسەر کۆمپانیاکە، حکومەت زۆر هەوڵی داوه بۆ پارێزگاری کردنی مافەکانی عێراقییەکان به هەموو ڕێگایەك[٢٧].

ئەو دەستەواژەیەی له ڕاگەیاندنەکەی حکومەتی عێراق و کۆمپانیاکەدا هاتبوو (بڕی ٤ شلن زۆر باشتره لەوەی بدرێت به حکومەتێکی تر)، بێ گومان مەبەست له ویلایەتی موسڵ بوو، که له بازنەی ململانێی دابوو لەنێوان تورکیا و بەریتانیا وعێراق، چەندین جار دەسەڵاتدارانی بەریتانیا هەڕەشەی گەڕانەوی موسڵیان دەکرد بۆ تورکیا ئەگەر عێراق ئیمتیازی نەوت نه بەخشێت به کۆمپانیای نەوتی تورکی[٢٨]، بۆیه حکومەتی عێراق زۆر به ئاشکرا ڕادەگەیەنێت، که چەند دەستکەوت لەم ویلایەته دەستکەوێت ئەوەنده قازانجی بۆ عێراقی عەرەبی تێدایه، چونکه باش دەزانن ئەم ناوچەیه هیچ ڕۆژێك له ڕۆژان سەر به جوگرافیای ویلایەتی بەغداو بەسره نەبووه، تاکو ئێستا بەریتانییەکان ئەگەر لەبەر بەرژەوەندییه نەوتییەکانی ئەم ناوچەیه نەبێت، نایلکێنن به عێراقی عەرەبییەوە.

دوای چەندین دانیشتن و کۆبونەوه لەنێوان نوێنەری کۆمپانیای نەوتی تورکی و لیژنەی گفتوگۆکەری وەزیرانی عێراق بۆ گەیشتن به ڕێککەوتنێك لەسەر ئیمتیازی نەوت، لیژنەی وەزیرانی قەناعەت به مەرجەکانی کۆمپانیا دێنی، لەوکاتەدا گۆڕانکاری دێت بەسەر هەڵوێستی بەریتانیا، ئاراستەوخۆ به لایەنی عێراقی ڕادەگەیێنێت، که مافی خۆیەتی لەبەشداریکردنی کۆمپانیا بەڕێژەی٢٠٪، بۆیه لیژنەی وەزیرانی عێراقی یەکسەر ئەو پێشنیازو خاڵانەی که گەیشتبوونه ڕێککەوتنێك لەگەڵ کۆمپانیا ڕەتدەکاتەوە[٢٩]، هۆکاری ئەم هەڵوێسته نوێیەی بەریتانیا بۆ چەندین هۆکار دەگەڕێتەوە، لەوانه ئەو ئیمتیازەی کۆمپانیای نەوتی تورکی وبەریتانیا دەیانویست، وەربیگرن له حکومەتی عێراقی به پلەی یەکەم چاویان بڕیبووه ویلایەتی موسڵ، چونکه زۆربەی نەوتی میزۆپۆتامیا لەو کاتەدا دەکەوته سنووری ئەم ویلایەتەدا بەپێی ئەو زانیاری و نەخشانەی له پێش جەنگی یەکەمی جیهانی ئامادەکرابوون:

William Eangdahl: Acentury of war Anglo-American Oil Politics.... p.٤١

هەر خودی ویلایەتی موسڵ له بازنەی کێشەو ململانێدا بوو لەنێوان تورکیا وبەریتانیاو عێراق[٣٠] تاکو ئەو کاتەش زلهێزەکان، که خوازیاری بەشداری بوون له کۆمپانیای نەوتی تورکیدا، نەگەیشتبوونه ڕێککەوتنێکی کۆتایی لەسەر دابەشکردنی پشکەکانی کۆمپانیای نەوتی تورکی، هەرچەنده دامەزراندنی ئەم کۆمپانیایه تەنها لەپێناو دەستبەسەراگرتنی نەوتی ویلایەتی موسڵ بوو، بەتایبەتی لایەنی ئەمریکی ڕازی نەبوو بەو ڕێژەیەی بۆی دانرابوو، ئەوەتا هەر له تەمووزی ساڵی (١٩٢٣) تاکو تەمووزی ساڵی (١٩٢٤) چەندین پێشنیازی بەریتانیا وفەرەنسای ڕەتکردەوه لەسەر دابەشکردنی پشکەکان و مەرجەکانی تر[٣١].

هێنری دۆبس هەر له سەرەتای دەست پێکردنی گفتوگۆکان فشاری زۆری خسته سەر حکومەتی عێراقی بۆ پابەندبوون بەهەموو مەرجەکانی کۆمپانیای (TPC) ەوه، بەڵام ئەم جاره هیچ هەڵوێستی نەبوو، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوه بۆ ئەو ئامۆژگارییانەی پێی گەیشتبوو لەلایەن وەزارەتی داگیرگەکانەوە، به هۆی ئەو فشاره زۆرەی لەسەر حکومەتی بەریتانیادا هەبوو لەلایەن دەوڵەتانی ترەوە، که پێوەندی به ئیمتیازی کۆمپانیای (TPC) هەبوو، بەتایبەتی ئەمریکاو فەرەنساو ئیتالیاو تورکیا، له ئەنجامدا دابەشبوونێکی زۆر بەدیدەکرا لەنێوان بەرژەوەندییه ئابوورییەکان وبەرژەوەندییه سیاسییەکانی بەریتانیا له عێراقدا، چونکه لەوکاتەی وەزارەتی داگیرگەکان و مەندووبی سامی له عێراق کاریان دەکرد بۆ گەیشتن بەڕێککەوتنێکی خێرا لەنێوان حکومەتی عێراق و کۆمپانیای (TPC)، وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا له (٤)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٢٣) داوا له وەزارەتی داگیرگەکان دەکات هیچ هەنگاوێك نەنێت بۆ مۆرکردنی ئیمتیاز تاکو کێشەی ویلایەتی موسڵ چارەسەر نەکرێت و کۆمپانیای (TPC) بگاته ڕێککەوتنێکی کۆتایی لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی تردا، به تایبەتی ئەمریکا وفەرەنسا، هەروەها ئەگەری ئەوه هەیه ئیتالیاو تورکیا قبوڵ بکرێت له کۆمپانیادا[٣٢].

وەزارەتی داگیرگەکان وەزارەتی دەرەوەی ئاگادار کردبووەوە، که مەترسی لەسەر بەرژەوەندییەکانی کۆمپانیاکەدا هەیە، چونکه زۆر به قورسیان دەزانی چیتر بتوانن فشار بخەنه سەر حکومەتی عێراق بۆ دواخستن و مۆرکردنی ئیمتیاز بۆ کاتێکی نادیار، دوای ئەوەی هەوڵێکی زۆردرا به گەیشتنی هەردوو لایەن به چەند خاڵێکی گونجاو لەنێوانیاندا[٣٣]، لەسەر ئاستی عێراقدا چەندین کۆمپانیا هەبوون که لەسەر وەرگرتنی ئیمتیازی نەوت پێشبرکێیان دەکرد، بۆ ئەوەی حکومەتی عێراق له کۆتاییدا ناچاربێت لەگەڵ یەکێکیان ڕێککەوێت[٣٤].

بەڵام وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا سوور بوو لەسەر هەڵوێستی خۆی، به وەزارەتی داگیرگەکانی ڕاگەیاند له (٢٣)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٤)، که حکومەتی عێراق دەبێت پابەند بێت به مادەی (٩) له پرۆتۆکۆلی ئیمتیازات

ـە پاشکۆی ڕێککەوتنی لۆزان لە (٢٤)ی تەمووزی ساڵی ١٩٢٣) دا هاتووە، کە دان بنێت بە ئیمتیازی کۆمپانیای TPC) لە هەردوو ویلایەتی موسڵ وبەغدا، هەروەها ئەم بەندە ڕێگرە لە هەر گرێبەستێك کە حکومەتی عێراق لەگەڵ کۆمپانیایەکی تر بیکا[٣٥].

بە پێی ئامۆژگارییەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا هێنری دۆبس بە قورسی زانی داوا بکات لە حکومەتی عێراقی بۆ ئەوەی مۆرکردنی ڕێککەوتن دوابخات لەگەڵ کۆمپانیای (TPC)، چونکە زۆر فشاری کردبووە سەر حکومەت بۆ ئەوەی رازی بێت لەسەر پێشنیازەکانی کیلینگ، بۆیە هەوڵی دا لە ڕێگای ڕاوێژکارانی بەریتانیا لە عێراق پلانەکەی جێبەجێ بکات. ئەوە بوو ڕاوێژکاران بە ئەندامانی لیژنەی وەزیرانی گفتوگۆکەری عێراقیان ڕاگەیاندبوو، کە تازلدن لە داواکاری مافەکانیان، لەسەر ئەم پێشنیازە، لیژنە جارێکی تر داواکاری ڕێژەی ٢٠٪ ی پشکەکان بۆ بەرژەوەندی عێراق لە کۆمپانیاکەی خستەوەڕوو، لە (١٩)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٤) بە کیلینگ یان ڕاگەیاند، هەروەها هێنری دۆبس بە وەزارەتی داگیرگەکانی ڕاگەیاند کە لیژنەی وەزیرانی عێراقی لە هەڵوێستی خۆیان پەشیمان بوونەتەوە جارێکی تر داوای ٢٠٪ی پشکەکان دەکەن بە پێی ڕێککەوتنی نێودەوڵەتیی سان-ڕیمۆ، کە پشکی ٢٠٪ بۆ حکومەتی عێراق تەرخان کردبوو[٣٦].

لە لایەکی تر حکومەتی بەریتانیا فشاری خستبووە سەر کۆمپانیای (TPC)، بۆ ئەوەی تاکو زووە ڕێککەون لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی تردا، لە ترسی هەر گرفتێکی سیاسی لەسەر کێشەی موسڵ، لەگەڵ ئەوەی کۆمپانیای (TPC) ڕازی بوو لەسەر ئەوەی پشکێك لە کۆمپانیاکە بە ئەمریکاییەکان بدات. بەڵام بەشداربوونی ئیتالیای ڕەتکردوە، هەروەها ڕوونیکردەوە، کە داواکاری ئیتالیا هیچ بنەمایەکی یاسایی و ئەخلاقی نیە لە بەشداربوون[٣٧].

ئەوەی شایەنی باس بێت شا فەیسەڵ زۆر خوازیاری بەخشینی ئەم ئیمتیازە بوو بۆ ئەوەی برێکی دارایی جێگیری لە نەوت دەستکەوێت، بۆیە لە شوباتی ساڵی (١٩٢٤) داوا لە هێنری دۆبس دەکات، کە ڕاوبۆچوونی خۆی بدات لەسەر پرسی نەوت.

لە (٢٥)ی شوباتی ساڵی (١٩٢٤) دا دانیشتنێکی فراوان بەسترا، کە زۆرینەی نوێنەرانی هەردوو وەزارەتی داگیرگەکان ودەرەوە ئامادەبوون لەگەڵ فەرمانگەی نەوت، بۆ تاوتێکردنی بابەتی نەوت، لەم دانیشتنەدا وەزارەتی داگیرگەکان سەرکەوتوو بوو لە قەناعەت کردن بە وەزارەتی دەرەوە بۆ پێشخستنی گفتوگۆ لەنێوان عێراق و کۆمپانیای (TPC)، لە (٥)ی ئادار بە هێنری دۆبس ڕاگەیاندرا، کە هیچ نارەزاییەك لە مۆرکردنی پرۆژەیەکی سەرەتایی لەنێوان هەردوولادا نیە، بەڵام بەم مەرجانەی خوارەوە:

١. بە هیچ شێوەیەك نابێت ناوی موسڵ بێت وەك شار یان ویلایەت لەم ڕێککەوتنەدا.

٢. ڕێگا نەدرێت بە کۆمپانیا بەوەی پرۆسەی گەڕان وپشکنینی جیۆلۆجی بکات لەم ناوچە ناکۆکەدا.

٣. دەبێت ڕێککەوتنی کۆتایی بخرێتە بەردەم حکومەتی بەریتانی پێش ئەوەی مۆربکرێت[٣٨].

هەر لە ڕۆژی دووەم کیلینگ ڕێککەوت لەگەڵ هێنری دۆبس بۆ پێشکەشکردنی پێشنیازێکی نوێ بۆ شا فەیسەڵ، کە تێیدا هاتبوو، بە پێدانی ڕێژەیەکی دیاریکراو لە نەوت، کە کۆمپانیا بەرهەمیدێنێت بە مەرجێك ڕێگا بدرێت بە کۆمپانیا بەکرینی پشکی حکومەت بە نرخێك کە بە ڕەزامەندی هەردوو لایەن بێت، بەرامبەر بەوەی حکومەت کۆمپانیاکە لە خاڵە ناکۆکەکان ڕازی بکات، بۆ ئەم مەبەستە کیلینگ لە (٩)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٤) چاوی کەوت بە شا فەیسەڵ و ڕێککەوتن لەسەر دەستنیشانکردنی پشکی حکومەت (١٨، ٢٪) لە نەوت، حکومەت ئەم پشکەی خۆی بفرۆشێت بە کۆمپانیا بە (٢٢شلن) بۆ هەر تەنێکی نەوت، کۆمپانیا پێداویستەکانی حکومەت لە نەوت دابین بکات بە نرخی تێچوونی پاڵاوتنی و گواستنەوەیدا[٣٩].

ئەم پێشنیازە لەسەر داواکاری وخواستی بەریتانیاو شا فەیسەڵ پێشکەشکرا بۆ دۆزینەوەی داهاتێکی دارایی لە نەوت بۆ بەهێزکردنی سوپای عێراقی وەك دەستپێکێك بۆ بەرگریکردن لە وڵات لە ئەستۆی حکومەت دابێت و لەسەر شانی حکومەتی بەریتانیا هەڵبگرێت[٤٠] چونکە بە پێی مادەی چوار لە ڕێککەوتنی سوپایی لە (٢٥)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٤) لەسەر حکومەتی عێراق بوو، کە بری ٢٥٪ ساڵانە لە داهاتەکانی وڵات تەرخان بکات لەپێناو پڕ چەککردنی سوپاو هێزی خۆجێیی[٤١].

لە (١٢)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٤) لە چاوپێکەوتنێك لەنێوان هێنری دۆبس و شا فەیسەڵ بۆ مۆرکردنی ئەم پێشنیازە، وەزارەتی داگیرگەکان پرسی کرد بە وەزارەتی دەرەوە بۆ ئەوەی ڕەزامەند بێت لەسەری، بەڵام وەزارەتی دەرەوە ڕێگای نەدا مۆربکرێت و تاکو کێشەی سنووری ویلایەتی موسڵ چارەسەر نەکرێت ڕەزامەندی دەرنابڕێت، بۆیە هێنری دۆبس ناچار بوو بەگەڕانەوە بۆ فشارخستنە سەر عێراق، هەوڵیدا گفتوگۆکانی نەوت دوابخات بۆ کاتێکی نادیار، بەبیانووی مۆرکردنی پاشکۆی پەیمانی عێراقی-بەریتانی لەگەڵ سەرۆك وەزیران (جەعفەر عەسکەری) لە (٢٥)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٤)، نوێنەری کۆمپانیای (TPC) لە (١٥)ی ئایاری ساڵی (١٩٢٤) گفتوگۆکانی لەگەڵ حکومەتی عێراقی ڕاگرت، کیلینگ عێراقی بەجێهێشت، لە (١٧)ی ئایار بۆ جەعفەر عەسکری ڕادەگەیێنێت، کە پێشنیازی کۆمپانیای هەڵوەشاندەوە لەدانی بری (١٨، ٢٪) پشکی نەوت بدات بە عێراق[٤٢].

وەزارەتی داگیرگەکان و کۆمپانیای (TPC) تووشی کێشەیەکی تر بوونەوە لەو کاتەی، کە ئەنجوومەنی تاسیسی عێراق[٤٣] لە (١٠)ی تەمووزی ساڵی (١٩٢٤) دا بڕیار لەسەر پەسەندکردنی یاسای بنەڕەتی (القانون الاساسی) دەدات[٤٤]، چونکە برگەی (٩٤) لە یاساکە جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی نابێت هیچ ئیمتیازێك ببەخشرێت بۆ وەبەرهێنانی هەر کەرەستەیەك لە سامانی سروشتی وڵات تەنها بە پێی یاسا نەبێت، هەر ئیمتیازێك سێ ساڵ بە سەریدا ڕۆیشتبێت،

دەبێت ڕەزامەندی پەرلمانی لەسەر بێت، بڕگەی (١١٤) دەڵێت:
"هەموو سیستەم و یاساکان، کە لەنێوان بەرواری (٥)ی تشرینی دووەمەی ساڵی (١٩١٤) دەرچوون تاکو بەرواری جێبەجێکردنی یاسای بنەڕەتی کاریگەربێت"، بڕگەی (١٢٣) دەڵێت:
"یاسای بنەڕەتی کاری پێدەکرێت لە بەرواری پەسندکردنی لەلایەن شای وڵات"[٤٥] بەم پێیەش دوای پەسندکردنی یاسای بنەڕەتی لەلایەن شا فەیسەل، بڕیاردان لەسەر بەخشینی ماف ئیمتیازی نەوت لە ئەستۆی پەرلەماندا دەبێت، ئەمەش زۆر قورسە بۆ بەریتانییەکان، چونکە پەرلەمان بیروبۆچوونی جیاوازی تێدایە، کە بەریتانیا ناتوانێت هەموویان ڕازی بکات، بۆ ئەم مەبەستەش بەریتانیا و کۆمپانیای (TPC) هەموو هەوڵەکانی خۆیان دەخەنەگەر بۆ ئەوەی ئیمتیازی نەوتی ویلایەتی موسڵ و بەغدا بە هیچ شێوەیەك نەخرێتە بەردەم پەرلەمانەوە[٤٦].

دوای ڕۆژێك لە پەسەندکردنی دەستووری عێراق (القانون الاساسي)، وەزارەتی داگیرگەکان بە هێنری دۆبس ڕادەگەیێنێت، کە زۆر گرنگە ئیمتیاز بەبەخشرێت، پێش ئەوەی ئەم یاسایە لەلایەن شا فەیسەل پەسند بکرێت، یاخود ئەگەر بکرێت، گفتوگۆکان لەگەڵ کۆمپانیای (TPC)، دەستپێبکاتەوە هەروەها کۆمپانیای (TPC) هەمان هەڵوێستی دەبێتو لە (١٦)ی تەمووز یادداشتێك دەداتە وەزارەتی داگیرگەکان بەوەی پەلە بکرێت لە هەوڵەکان بۆ بەخشینی ئیمتیاز، (هێنری دۆبس) یش لەلای خۆیەوە ئامۆژگاری دەدا بە حکومەتی عێراقی بۆ دەست پێکردنەوەی گفتوگۆکان لەگەڵ کۆمپانیای (TPC)، هەمان کات بە کۆمپانیای ڕاگەیاند، کە پێویستە کیلینگ بگەڕێتەوە بۆ بەغدا بە زووترین کات[٤٧].

بە هۆی بارودۆخی سیاسی ناوخۆی عێراقی ئەوکاتە، بە کورتی ماوەی حکومەت لەبەر هەر هۆیەك بێت، تەنانەت وەزارەتی جەعفەر عەسکەریش، لەبەر ئەوەی لە حکومەتی ئەودا پەیمانی عێراقی-بەریتانی مۆرکرا، بە حکومەتێکی لاواز دانرا، بۆیە فشار کرایە سەری بۆ ئەوەی دەست لەکاری حکومەت بکشێتەوە، هەروەها نارەزایی هەبوو لە ناوخۆی عێراق دا بە تایبەتی لە ڕۆژنامەکاندا، کە داوای حکومەتێکی بە هێزیان دەکردو جەختیان دەکردەوە لەسەر پرسی نەوت[٤٨].

بۆیە هێنری دۆبس و شا فەیسەل بیریان لەوە دەکردەوە، کە وەزارەتێکی بە هێز بێت، کە هەم لایەنی ناسیۆنالستەکان پشتگیری لێبکات هەم بتوانێت ئیمتیاز ببەخشێت، بە شێوەیەك کە ئامانجەکانی بەریتانیا دەستەبەربکات، بۆیە بیریان بۆ (یاسین هاشمی) چوو، هەروەها بە باشترین کەسیان دانا بۆ ئەم (ئەرکە)، چونکە لە کاتی مۆرکردنی پەیمانی عێراقی-بەریتانی ڕۆڵێکی گرنگی بینیبوو کە لەسەرەوە نارەزایی هەبوو، بە نهێنیش ئامۆژگاری دەدا بە ئەندامانی ئەنجوومەنی تأسیسی بۆ پەسەندکردنی[٤٩].

دوای پێکهێنانی وەزارەتی هاشمی گفتوگۆکان لەنێوان حکومەتی عێراق و کۆمپانیای (TPC) دەستی پێکرد، نوێنەری کۆمپانیا کیلینگ گەرایەوە بۆ بەغداو لە (١٤)ی ئابی ساڵی (١٩٢٤) بە ئەنجوومەنی وەزیران کۆبووەوە، لەم دانیشتنەدا داواکرا لە کیلینگ، کە بەڵێنی نووسراو پێشکەش بکات بۆ دەست پێکردنەوەی گفتوگۆکان، بەڵام ساسۆن حسقێل بە نوێنەری کۆمپانیا ڕاگەیاند، هەر ڕێککەوتنێك مۆربکرێت دەبێ ڕەزامەندی ئەنجوومەنی وەزیرانی لەسەر بێت، لە هەمان کاتدا ئەنجوومەنی وەزیران ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر دامەزراندنی لیژنەیەکی وەزیران بۆ تاوتێکردنی پێشنیازەکانی کۆمپانیا، ئەم لیژنەیە لە سەرۆك (یاسین هاشمی) لەگەڵ نوێنەرایەتی ساسۆن حسقێل وەزیری دارایی و موزاحەم پاچەچی وەزیری گواستنەوە وئەشغال ورەشید گەیلانی وەزیری داد پێکهاتبوو[٥٠] هەروەها لیژنەی وەزیرانی نوێ پێشنیازەکانی پێکهاتبوو لەوەی ماوەی ئیمتیاز لە ٦٠ ساڵ زیاتر نەبێت، دووڕخستنەوەی ویلایەتی بەسرە لە سنووری ئیمتیاز، لەگەڵ جەختکردنەوە لەسەر پشکی عێراق، دەبێت ٢٠٪ بێت، بەڵام ڕەزامەندی دەربڕا لەسەر تۆمارکردنی کۆمپانیا لە دەرەوەی وڵات، بەرامبەر بەوە داواکرا عێراق نوێنەری هەبێت لە ئەنجوومەنی کۆمپانیا، بەڵام ئەم مەرجانە، کە لیژنە خستیەروو دەربارەی نارازییە لەسەر سیستەمی پارچەیەی (نظام القطع) و داوایی کرد ئەو ناوچانە لەلایەن کۆمپانیا مامەڵەیان لەسەر بکرێت[٥١].

ئەم مەرجە نوێیە لەلایەن حکومەتی بەریتانیا بە عێراق ڕاگەیاندرابوو، چونکە بە مەزەندەی بەریتانیا سیستەمی پارچەیی کاردەکاتە سەر دامەزراندنی ژمارەیەکی زۆر لە بەرژەوەندیی بیانی لە عێراق، هێنری دۆبس هەستی کردبوو بەوەی وەزیرەکانی عێراق کەیفیان بە ئەمریکا، فەرەنسا، تورکەکان وبەلشەفیەکان نایێت، بەڵام کۆمپانیا هەموو مەرجەکانی عێراقی ڕەتکردەوە جگە لە مەرجی کۆتایی، ئەویش لەبەر بەرژەوەندیی خۆی بوو[٥٢].

لەو کاتەی هێنری دۆبس هانی لیژنەی وەزیرانی دەدا، کە دەستبەرداری چەند خاڵێك نەبێت، مەبەستیش ئەوە بوو، کە گفتوگۆکان درێژەی بکێشن لەبەر خواستی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا، بەڵام لە لایەکی ترەوە پێداگرت لەسەر وەزارەتی داگیرگەکان بەوەی زۆر پێویستە ئەم بابەتە یەك لایی بکرێتەوە، ئەوە بوو لە (١٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٤) بە وەزارەتی داگیرگەکانی ڕاگەیاند، کە کۆمپانیا ئەوەی لە توانایدا هەبوو پێشکەشی کردەوە، بەڵام حکومەتی عێراقی بەدوای بیانوو دەگەڕێت، بۆیە داوای ڕەزامەندی کرد بۆ وریاکردنەوەی حکومەتی عێراق لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە:

١. حکومەتی بەریتانیا ئەو مەرجانەی کۆمپانیای (TPC) خستویەتەروو بە یەکسان وپەسەند دەزانێت.
٢ بە پێی ئەم مەرجانە دەبێت عێراق ئیمتیاز دەبەخشێت، جگە لە مەرجەکانی پەیمانی لۆزان و سان-ڕیمۆ.
٣. ئەگەر حکومەتی عێراق ڕەزامەندی دەرنەبڕێت لەسەر ئیمتیاز، ئەوا حکومەتی بەریتانیا پرسی ئیمتیازی (TPC) دەباتە بەردەم ناوبژیوانی نێودەوڵەتی لە دوای کۆتایی هێنانی کێشەی موسڵ[٥٣].

لە ٢١ تشرینی یەکەمی ١٩٢٤دا چەند برگەیەکی تر زیادکرا لە ڕاپۆرتێکی هێنری دۆبس بۆ وەزارەتی داگیرگەکان و پێیان ڕادەگەیەنێت، کە تاکو ئێستا حکومەتی عێراقی دان نانێت بە ڕێککەوتنی سان-ڕیمۆو لۆزاندا لەگەڵ ئەوەی برگەی ١٧) لە پەیمانی عێراقی-بەریتانی لەسەر ئیمتیازی (TPC) هیچ ناچەسپێنێت، بۆیە داوای بەدیل دەکرێت، هەروەها پێشنیازی کرد بەوەی برگەیەکی تر پێشکەش بکرێت بەوەی حکومەتی بەریتانیا ناچار دەبێت بە ڕاگەیاندنی، کە هیچ ڕەزامەندی دەرنابڕێت بە بەخشینی هەر ئیمتیازێك نەوت لە هەردوو ناوچەی بەغداو موسڵ بە هەر کۆمپانیایەك جگە لە کۆمپانیای (TPC) [٥٤].

بەڵام وەزارەتی داگیرگەکان هیچ ڕەزامەندی دەرنەبڕی لەسەر پێشنیازەکانی هێنری دۆبس، لە (١٣)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٤) دا پێی ڕاگەیاندن، کە بۆچوونەکانی بەریتانیا ئەوەیە، کە کۆمپانیای (TPC) خاوەندارییەتیی جێگیری هەیە لەم ئیمتیازەدا، هەرچەندە کۆمپانیا ڕازی بوو لەسەر چەند مەرجێك، کە پێشتر ڕەتیکردبووەوە، بەڵام دەبێت بگاتە ئەنجامێکی گونجاو بەزووترین کات دەربارەی خاڵە ناکۆکەکانی لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١. بەخشینی ئیمتیاز لە کاتی پەسەندکردنی دەستوور دوادەکەوێت.

٢. لە ئەنجامی ئەمەدا حکومەتی عێراقی لە وەرگرتنی داهاتی نەوت دوادەکەوێت.

٣. کۆمپانیای (TPC) گەورترین وبەهێزترین دامەزراوەیە لەڕووی توانای دارایی وئەزموونی هونەرییەوە.

٤. چارەسەری کۆتایی بەخشینی ئیمتیازە، چونکە یارمەتی وئاسانکاری پێشکەشدەکات بە مافەکانی عێراق لەسەر کێشەی سنوورەکانی باکووریدا (مەبەست ویلایەتی موسڵ) ە، هەروەها لە هەر هەوڵێکدا، کە لەلایەن بەرژەوەندییەکانی ترەوە بکرێت، سەرکەوتوو دەبێت لەگەڵ تورکیادا، بۆیە وەزیری داگیرگەکان داوا دەکات لە هێنری دۆبس کە چاوپێکەوتن لەگەڵ شا فەیسەڵ و یاسین هاشمی بکات، دەسەڵاتی خۆی بەکاربهێنێت بۆ گەیشتن بە چارەسەرێك بەبێ ئەوەی هەڕەشە بە کاربهێنێت [٥٥]. هێنری دۆبس لە (٢٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٤) دا ئامۆژگاری دا بە هەریەك لە سەرۆك وەزیران یاسین هاشمی وساسۆن حسقێل و موزاحەم پاچەچی بۆ ئەوەی ڕێککەون لەگەڵ کیلینگ، کاری پێویست بکەن بۆ مۆرکردنی ئیمتیاز پێش بڵاوبوونەوەی دەستوور [٥٦].

حکومەتی بەریتانیا، بەتایبەتی وەزارەتی دەرەوەی نەیدەویست کۆمپانیای (TPC) بگاتە ڕێککەوتنێك تاکو کێشەی موسڵ چارەسەر نەکات، بۆیە جارێکی تر هانی کۆمپانیاکانی تر دەدات وەك (چینی و هولمن) بۆ گفتگۆکردن لەگەڵ حکومەتی عێراق لەسەر ئیمتیازی نەوت [٥٧]. ئەمەش تەنها بۆ فشار خستنە سەر کۆمپانیای (TPC) بوو.

لەلایەکی تر دەیویست هەم فشار بخاتە سەر حکومەتی عێراق هەم کۆمپانیای (TPC) بە هاندانی بەرژەوندەییەکانی تری نەوتی بەریتانیا، کە لەگەڵ تورکیا بەپشتیوانی وپشتگیری حکومەتی بەریتانیا دەربارەی کێشەی موسڵ و ئیمتیازی نەوتەکەیدا گفتوگۆ بکەن، فرانسیس ریکیت (F.Rickett) نوێنەری لۆرد ئەنڤر فورت (Inver forth) وئەندریۆ وایەر (Andrew Weir) کاریان دەکرد بۆ دەستکەوتنی ئیمتیازی نەوتی موسڵ لەلایەن حکومەتی تورکیاوە، هەروەها گرووپێکی تری بەریتانیا، کە کاپتن لارکینگ (A.H.Larking) سەرۆکایەتی دەکرد، بۆ هەمان مەبەست کاری دەکرد. تورکەکانیش خوازیاری ئەوە بوون، کە لە ڕێگای ئیمتیاز بەخشنەوە بە گرووپی بەریتانی بگەنە چارەسەرێك لەگەڵ بەریتانیا دەربارەی کێشەی موسڵ بۆ بەرژەوەندی خۆیان، ئەنڤر فورت هەوڵیدا حکومەتی بەریتانیا قایل بکات بە دەستهەڵگرتن لە موسڵ بۆ تورکیا لەپێناو دەستکەوتنی ئیمتیازی نەوتی ویلایەتی موسڵ بە تەنها، هەروەها لارکنك پێشنیازی کرد، کە نیوەی بەرهەمی نەوتی دەرهێنراوی ویلایەتی موسڵ بدرێت بە کەشتییەکانی بەریتانیا بە نرخی تێچوون بەرامبەر بەوە حکومەتی بەریتانیا پشتگیری بکات لە خواستەکانی [٥٨].

ئەم ڕووداوانە کۆمپانیای (TPC) یان زۆر نیگەران کرد، بەڵام وەزارەتی داگیرگەکان پێی ڕاگەیاندبوو، کە هیچ گرنگی نەدات بەم داواکاریانە، ئەو کۆسپەی ڕێگری دەکات تەنها بەرهەڵستی گولبەنکیانە، کە لەسەر مەرجی (ڕێککەوتنی کار)، کە ئەمریکا زۆر پێی داگرت لەسەری، هەروەها مەترسی نییە لەوەی ئیمتیازی نەوت ببرێتە بەردەم ناوبژیوانی نێودەوڵەتی بۆ مۆرکردنی [٥٩].

کۆمپانیای (TPC) زۆر مەترسی هەبوو لەم ڕووداوانە، بۆیە بیری لە پێشنیازێکی نوێ دەکردەوە و هەوڵیدەدات پارە وەك بەرتیل بە حکومەتی عێراق بدات، تاکو هانی بدات ئیمتیازی پێی ببەخشێت، هەوڵی دا ئەم پێشنیازە بە وەزارەتی داگیرگەکان، لە ڕێگای سکلیرۆز (Skliros) ڕابگەیەنێت، کە نوێنەری کۆمپانیای (TPC) بوو، هەروەها بە مستر ڤێرنۆن (R.V. Vernon) لە فەرمانگەی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست لە وەزارەتی داگیرگەکان. بروسکەیەك لەلایەن کیلینگ هاتبوو، دەڵێت:

"کە میجەر هوڵمز بڕی ٥٠ هەزار پاوەنی پێشکەش بە شا فەیسەڵ کردووە تەنها بۆ بەخشینی ئیمتیازی نەوت، شا فەیسەڵ خواستی هەیە قبوڵی بکات..."، هێنری دۆبس لایەنگری داواکاری کیلینگی کرد وبەوەزارەتی داگیرگەکانی گەیاند لە (١٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٤)، کە بڕێکی پارەی زۆر پێشکەشکردووە بە شا فەیسەڵ لە ڕێگای هوڵمز، کە نوێنەرایەتی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا دەکات، ئەم بۆچوونانەی کیلینگ وهێنری دۆبس تەنها بۆ فشارخستنە سەر حکومەتی بەریتانیا بوون، بۆ ئەوەی پرسی ئیمتیازی نەوت یەکلایی بکاتەوە [٦٠].

گولبەنکیان دەڵێت: "یاریدەری سەرۆکی کۆمپانیا نیکولز کاتێك دەگاتە بەغدا بۆ گفتوگۆکردن، لەگەڵ خۆیدا ٤٠ هەزار پاوەنی ئەسترلینی وەك دیارییەکی بچووك پێشکەش بە شا فەیسەڵ کردبوو" [٦١].

لە (٢٩)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٤) کۆمپانیای

(TPC) ناچاربوو پشكی یەكسان بە ئەمریكییەكان بدات، هاوشێوەی پشكەكانی لایەنەكانی تر لە كۆمپانیادا[٦٢]، بۆیە ڕێگای خۆش كرد بۆ پێشكەوتنی گفتوگۆكان لەگەڵ حكومەتی عێراقی، هێنری دۆبس سەرۆكایەتی چەندین گفتوگۆی كرد بەشێوەكی نافەرمی، چەندین كۆبونەوەی لیژنەی وەزیرانی لەنێوان (١٠-١٢)ی كانوونی یەكەمی ساڵی (١٩٢٤) بە ئامادە بوونی كیلینگ، بۆیە لیژنە داوایكرد حكومەتی عێراقی جێگای كۆمپانیا بگرێتەوە بۆ هەڵبژاردنی ئەو لایەنە دەیەوی پارچە زەوییەكانی (دەرەوە) بە كرێ بگرن، لیژنە مەترسی دەربری لەسەر تۆماركردنی كۆمپانیاو لقەكانی لە بەریتانیا، لیژنە سوور بوو لەسەر بەشداربوونی كۆمپانیا بە ڕێژەی ٢٠٪[٦٣].

هەر چەندە حكومەتی بەریتانیا خوازیاری دەستەبەركردنی داهاتێكی دارایی جێگیر بوو لەلایەن كۆمپانیای (TPC) بۆ حكومەتی عێراق بۆ دابینكردنی خەرجییەكانی كارگێڕیو سەربازی، كەمكردنەوەی خەرجییەكان لەسەرشانی بەریتانیا، بۆیە ساسۆن حسقێل داوای یاسایی پارێزگاریی مافەكانی حكومەتی عێراقی دەكرد لەڕووداونی هەر كەم بوونەوەیەك لە نرخ وبەهای پاوەنی ئەسترلینی لە ماوەی ئیمتیازدا[٦٤].

هێنری دۆبس هەموو داواكارییەكانی لیژنەی وەزیرانی ڕەوانەی وەزارەتی داگیرگەكان كرد بۆ ئەوەی بۆچوونی خۆیان لەسەری دەربرن، بەڵام وەزارەتی داگیرگەكان بە نووسراوێكی نهێنی بە ژماری (ب-او٢٢٦) كە لە (٢٤)ی كانوونی یەكەمی ساڵی (١٩٢٤) بۆ ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراقی ڕەوانەدەكات، هەمان ئەو وەڵامەی، كە لە (١٢)ی شوباتی ساڵی (١٩٢٤) بە شا فەیسەڵیان ڕاگەیاندبوو، كە ناتوانێت هیچ زەمانەتێك بدات دەربارەی ئیمتیازی بیانی، لەم نووسراوە ئاماژەی كرد بوو بەوەی كە كۆمپانیا لەبەر ئارەزوی وەبەرهێنەرەكان لە بەریتانیا تۆماردەكرێت، ماف بەشداربوونی حكومەتی عێراقی لە كۆمپانیا ڕەتكردەوە، چونكە لە كاتی بەرهەمهێنانی نەوت بەرهەمەكەی بە سەر بەشداربوواندا بە نرخی تێچوون لەگەڵ قازانجێكی كەم، دابەشدەكرێت. بۆیە عێراق هیچ قازانجێك ناكات لە فرۆشتنی ئەم نەوتەدا، ئەگەر پشكی هەبوو لە كۆمپانیاكەدا، بۆیە ئامۆژگاری كرد دەستهەڵگرێت لەم مەرجەدا و بایەخدان بە نوێنەرایەتی لە ئەنجوومەنی بەڕێوەبەردنی كۆمپانیا باشترە، بەڵام سەبارەت بە زەمانەتی داهاتی عێراق دەتوانرێت لەسەر بناغەی ئاڵتوون یاخود دۆلار بخەملێندرێت[٦٥]. كۆمپانیا ڕازی بوو بە دامەزراندنی نوێنەری حكومەتی عێراق لە كۆمپانیا، بەڵام بەمەرجێ، كە عێراق یەكسەر ئیمتیاز مۆربكات، بەڵام ئەگەر ئیمتیاز لەلایەن حكومەتی عێراق خرایە بەردەم ئەنجوومەنی تأسیسی، ڕەتدەكرێتەوە[٦٦].

هێنری دۆبس سەرۆكایەتی دوو كۆبونەوەی كۆتایی لەگەڵ لیژنەی وەزیرانی عێراقدا كرد بە ئامادەبوونی كیلینگ و هەردوو ڕاوێژكاری ئینگلیز لە (١٩) و (٢٠)ی كانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٥)، بۆ لیژنەی ڕوونكردەوە، كە ماف حكومەتی عێراقە، لە كۆمپانیا بەشداری بكات، بەڵام بەرژەوەندییەكانی فەرەنسی و ئەمریكی لەسەر هەڵوەشاندنەوەی ئەم مافە هاتنە ناو كۆمپانیاكەوە، حكومەتی عێراقی لە كاتی خۆیدا داوای ماف خۆی نەكردبوو[٦٧]، كیلینگ بە لیژنەی ڕاگەیاندبوو كە عێراق ماف ئەوەی دەدرێتی لە كۆمپانیادا نوێنەرایەتی بكات و ماف دەنگدانی دەبێت، ئەگەر عێراق دەستهەڵگرێت لە ماف بەشدابوون لە كۆمپانیا، بەڵام لیژنە ئەوەی ڕەتكردەوە[٦٨].

دەسەڵاتدارانی بەریتانیا زۆر سوور نەبوون لە فشار خستنە سەر عێراق، چونكە دەیانویست سوود لە ڕەتكردنەوەی عێراق وەدەست هەڵنەگرتنی لەسەر ماف بەشداربوون وەربگرن، بۆ دواخستنی گفتوگۆكان، بۆ ئەوەی فشار بخەنە سەر بەرژەوەندییەكانی ئەمریكا وفەرەنسا، بۆ دابینكردنی بەرژەوەندییە سیاسی وئابوورییەكانی بەریتانیا لە عێراق، بۆ دەستەبەركردنی هەندێك لە داهاتی جێگیر بۆ حكومەتی عێراق لە نەوت، بە شێوەیەكی تایبەت پێدانی داهاتی عێراق بە ئاڵتوون بێت، بەڵام لە (٥)ی كانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٥) دا هێنری دۆبس، وەزارەتی داگیرگەكانی ئاگادار كردەوە، كە ڕووخانی حكومەتی عێراق زۆر نزیكە، بەم شێوەیە كۆمپانیا ناچاردەكرێت لەگەڵ وەزارەتی نوێیدا گفتوگۆ بكات، وەڵامی وەزارەتیش ئامۆژگاریدا بە كۆمپانیا، كە پەلە بكات لە ڕێككەوتن، پێش ڕووخانی حكومەتی عێراق[٦٩].

كۆمپانیا ناچاربوو داهاتی عێراق بە ئاڵتوون دابین بكات، بەمەرجێك هیچ هەمواركردنێك لە پرۆژەی ڕێككەوتندا نەكرێت، داوای كرد ئیمتیاز مۆربكرێت، هەروەها وەزارەتی داگیرگەكان لە (٧)ی شوباتی ساڵی (١٩٢٥) داوای لە هێنری دۆبس كرد ئەم پێشنیازە بخاتە بەردەم حكومەتی عێراق و بۆیان ڕوون بكاتەوە كە چەند سوودمەند دەبن لە كاتی مۆركردنی ئیمتیاز بە زووترین كات بە بێ ئەوەی هەڕەشە بەكاربهێنێت[٧٠].

لیژنەی وەزیرانی عێراق نەگەیشتە ڕێككەوتنێك لەگەڵ كیلینگ، لە (١٦)ی شوباتی ساڵی (١٩٢٥) ڕاپۆرتی خۆی پێشكەش بە ئەنجوومەنی وەزیران كرد، خاڵە ناكۆكەكانی خستەڕوو لەگەڵ كۆمپانیا، هەروەها دووپاتی كردەوە، كە دەستبەرداری ماف عێراق نابێت لە بەشداربوونی كۆمپانیا و ماف (٢٤) پارچە زەوییەكانی دەرەوە، دەبێت كۆمپانیا لە عێراق تۆماربكرێت، لەگەڵ ئەوەی شایستەی ڕۆڵی هێنری دۆبسی كرد لە پشتگیری لە داواكارییەكانی لیژنە[٧١]. بەپێی ڕاپۆرتی لیژنە دەردەكەوێت، كە هێنری دۆبس لەم قۆناغە لایەنگری حكومەتی عێراق بوو لە بەشداریكردنی كۆمپانیاكە، بەڵام بە نهێنی كاری دەكرد لە دروستكردنی بەرهەڵستی لە ناو ئەنجوومەنی وەزیران بۆ ئەوەی ئیمتیاز مۆرنەكرێت لەم كاتەدا، چونكە بەریتانیا كۆنترۆڵی كۆمپانیای (TPC) لەدەست دابوو، دوای ئەوەی ڕێگا درا بە بەشداریكردنی ئەمریكا بە پشكی هاوبەش، بە حكومەتی عێراقی ڕاگەیاندبوو، كە ئەمریكا وفەرەنسا ماف عێراقیان زەوتكردووە لە بەشداربوونیان لە كۆمپانیاكەدا[٧٢]، بۆیە هەریەك لە وەزیری داد (ڕەشید عالی گەیلانی) و وەزیری گواستنەوەو ئەشغال (موزاحەم پاچەچی) و وەزیری مەعاریف (محەمەد ڕەزا شبیبی) لە بەرهەڵستكاران بوون،

هەڕەشەی کشانەوەیان دەکرد لە وەزارەت، ئەو وەزیرانەی ڕازیبوون ئیمتیاز ببەخشرێت هەر یەك لە (دارایی، ناوخۆ، ئەوقاف) بوون[٧٣] بەم شێوەیە یەکسانیی ڕاوبۆچوونەکان بە خواستی بەریتانیا بوو، چونکە پلانێکی دارشتبوو کە نە ئیمتیاز ببەخشرێت ونە ڕەتبکرێتەوە، تا چارەسەری کێشەی موسڵ دەکرێت.

ئەو سیاسەتە دووفاقییەی، کە حکومەتی بەریتانیا لەسەر پرسی ئیمتیازی نەوت پەیڕەویی دەکرد بەتایبەتی لەنێوان وەزارەتی داگیرگەکان و وەزارەتی دەرەوە، تەنانەت لەسەر هەڵوێستی وەزیرە عێراقییەکانیش کاردانەوەی هەبوو، ئەوە بوو وەزارەتی داگیرگەکان دەیویست عێراق ناچار بکات بە دەستهەڵگرتن لەسەر مەرجی پێدانی پشکی (٢٠٪)ی لە پشکەکانی کۆمپانیاو لە کۆتاییدا ئیمتیاز ببەخشێت بە کۆمپانیای (TPC)، بەڵام وەزارەتی دەرەوە بەردەوام سوور بوو لەسەر ئەوەی نابێت لەم کاتەدا ئیمتیاز ببەخشرێت پێش ئەوەی ئایندەی ویلایەتی موسڵ دەربکەوێت، هەروەها بە کارهێنانی پرسی ئیمتیاز بۆ دەستەبەرکردنی لایەنەکانی تری وڵاتان لە دژی تورکیا، بۆیە لەسەر حکومەتی عێراق بوو ناچار بێت ئەو بارودۆخە قەبووڵ بکات، تاکو حکومەتی بەریتانیا هەڵوێستی خۆی یەکلایی بکاتەوە بە شێوەیەکی کۆتایی و کێشەی ویلایەتی موسڵ لە بەرژەوەندیی خۆیان دابێت.

ئەم بارودۆخە حکومەتی عێراق لە ژێر فشارێکی زۆری نارەزایی لە ڕاگەیاندن و ڕۆژنامە وپارتە بەرهەڵستکارەکانی بەغدا بوو، کە هەموویان داوای نەبەخشینی ئیمتیازیان دەکرد تاکو ئەنجوومەنی تأسیسی کۆنەبێتەوە دەربارەی دەستوور، زۆر هەڵوێستیان دژی کۆمپانیای (TPC) وەرگرتبوو[٧٤].

حکومەتی عێراق تووشی چەندین گرفتی تر ببوو، لەوانە بارودۆخی دارایی تووشی کەموکوری هاتبوو لەنێوان ساڵانی (١٩٢٤-١٩٢٥) [٧٥]، لەگەڵ هێرشی چەکدارانی وەهابییەکان لە بەشی باشووری ڕۆژئاوا، کە بەبیانووی بەرژەوەندییە نەوتییەکان هاندەدرانن، لە باشووری کوردستانیشدا هێزەکانی شێخ مەحمود فشارێکی توونديان خستبووە سەر حکومەتی عێراق[٧٦].

یاسای هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی تأسیسی لە عێراق وەك یاسای ئەساسی گرفتێکی تر بوو، چەندین هۆکار هەبوون بۆ ئەوەی ئەم دوو یاسایە دوابکەون: یەکەمیان حکومەتی عێراق پرۆسەی هەڵبژاردنەکانی دواخست لە (٣)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٥) دا لەبەر ئەوەی گومانی ئەوە دەکرا ڕێژەی دانیشتووان زیادی کرد بێت، ئەم هەنگاوەی حکومەت هەردوو وەزارەتی داگیرگەکان و کۆمپانیای (TPC) خۆش حاڵ کرد، چونکە ڕێگربوون لە دەستکەوتی ئیمتیازدا. دووەمیان لەو کاتی لیژنەی سنووری نێودەوڵەتی گەیشتە موسڵ، حکومەتی عێراق یەکسەر هەوڵی دواخستنی هەڵبژاردنەکان و بڵاوکردنەوەی دەستووری دا، چونکە دەسەڵاتدارانی موسڵ وهەولێر نەیاندەویست پرۆسەی هەڵبژاردنەکان بەردەوام بێت لە کاتی بوونی لیژنەدا[٧٧].

دوای داواکارییەکی زۆر لەلایەن هێنری دۆبسەوە وەزارەتی داگیرگەکان ناچار بوو بابەتی ئیمتیاز بخاتە بەردەم حکومەتی بەریتانیاو لە (٢٣)ی شوباتی ساڵی (١٩٢٥) دوو یادداشتی پێشکەشکرد بە ئەنجوومەنی وەزیران: یەکەمیان گفتوگۆکانی نەوت بوو لەنێوان حکومەتی عێراق و کۆمپانیای (TPC) لە خاڵە ناکۆکەکان وبەربەستەکان، کە ئاماژە دەکات بەوەی چیتر پیاوانی کۆمپانیای نەوت چاوەڕوان ناکەن و نابێت ئیمتیاز لەوە زیاتر دوا بکەوێت، چونکە ئەگەری کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی تأسیسی لە ئارادایە. ئەگەری دەستێوەردانی دەرەکی هەیە لەگەڵ ئەگەری کشانەوەی ئەمریکییەکان لە کۆمپانیادا، تا هەوڵی ئیمتیاز بدەن ڕاستەوخۆ لەگەڵ حکومەتی عێراق[٧٨]. دووەم یادداشت ئەوە بوو، کە ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراقی نایانەوێت بچنە ژێر بەرپرسیارێتی بەخشینی ئیمتیاز بەبێ هیچ هۆکارێك، بەڵام دەیانەوێت فشار بخرێتە سەریان بۆ ئەوەی بڵێن، کە هێزێکی گەورە ناچاریانی کردووە و ئەگەر پەرلەمان ڕەتیکردەوە، ئەوا بەریتانیا تووشی ڕەخنە دەبێت و ئامانجەکان ڕوون دەبێتەوە، کە هەبوونی لە عێراق لەبەر نەوتە[٧٩].

لە (٢٧)ی شوبات جارێکی تر لیژنەی سنووری نێودەوڵەتی کۆبووەوەو داوای لێکۆڵینەوەی هەڵوێستەکان کرا لە هەموو لایەنەکان، ئەو لیژنە سنووریە لە عێراق بە گرنگی سەیرکرا. هەوڵەکانی تورکیا، کە دەیەوێت بە جیهان ڕاگەیەنێت بەرژەوەندی بەریتانیا لە عێراق لەبەر نەوتە، بۆیە لیژنە بە باشی زانی فشار بخرێتە سەر کۆمپانیای (TPC)، کە خۆی ئارام بگرێت، تاکو دەستنیشانی ئایندەی ویلایەتی موسڵ دەکرێت و داوای کرد لە کۆمپانیا، کە کار بکات بەوەی پوختەی داهاتی عێراق (٤شلن) بێت[٨٠].

دوای ئەوەی لیژنەی سنووری نێودەوڵەتی دامەزرا بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ کێشەی موسڵ، بەهاتنی لیژنەی سنووری بۆ بەغدا لە (١٦)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٥) دەستێوەردانی لیژنە لە پرسی ئیمتیازی نەوت بۆ کۆمپانیای (TPC) بەئاشکرا دیار بوو، هەروەها کاریگەری هەبوو لەسەر ئەم بابەتە. هێنری دۆبس لیژنەی سنووری کردە کارتێك بۆ ناچارکردنی حکومەتی عێراق بەوەی دەستهەڵگرێت لە داواکاری بەشداربوون لە کۆمپانیادا، وەك دەستپێکێك بۆ بەخشینی ئیمتیاز لە کاتی گونجاودا، لە سەرەتای شوباتی ساڵی (١٩٢٥) بە سەرۆك وەزیرانی (یاسین هاشمی) بە شێوەیەکی زارەکی ڕاگەیاندرا، کە وەزارەتی داگیرگەکان وکۆمپانیا هەر هەموارکردنێك لەسەر پرۆژەی ڕێککەوتن ڕەتدەکەنەوە کە لە بەرژەوەندی عێراق دابێت، وداوایان کرد ئەم بۆچوونانە بە فەرمی ڕاگەیەنرێن، بۆ ئەوەی شا فەیسەڵ و وەزیرەکان ئاگاداربن[٨١].

هێنری دۆبس لە (٧)ی شوباتی ساڵی (١٩٢٥) دا بە یاسین هاشمی ڕاگەیاندبوو، بەوەی باوەڕناکا کۆمپانیای (TPC) ڕازی بێت حکومەتی عێراق پشکی (٢٠٪)ی دەستکەوێت لە کۆمپانیاکەدا، لەلایەکی تریشەوە هیواو ئاواتی زۆری هەیە بەوەی حکومەتی عێراقی ئەم مەرجە بکشێنێتەوە بڕیاری گرنگ بدات لەسەر ئیمتیاز وئەو بارودۆخەی هەیە، لە سەر گۆڕەپان ڕەچاو بکات، چونکە وا دەڕوانێت بوونی

ژمارەیەکی زۆر لە گرووپی نێودەوڵەتی، کە گرنگی دەدەن بە نەوتی ویلایەتی موسڵ و بەغدا، کە دەستەبەرکردنی یارمەتیدەرە بۆ جێگیرکردنی دەوڵەتی عێراق و بەرگریکردن لێی، بۆیە پێویستە حکومەتی عێراق کاریگەری هەبێت لەسەر لیژنەو ئەو گرووپانەی لە ڕێگای ئیمتیازدان، هەروەها لە بەرژەوەندی عێراق دایە، کە بگەنە بڕیاری نزیك، کە پەیوەندی بە ئیمتیازی نەوتی موسڵ بۆ دەستکەوتنی سنوورەکانی هەبێت[٨٢].

هێنری دۆبس لە (٢٦)ی شوباتی ساڵی (١٩٢٥) نووسراوێکی تر دەنێرێت بۆ سەرۆك وەزیرانی عێراق، کە لەناوەڕۆکیدا پرسیارێك هاتبوو کە لیژنەی سنوور دەربارەی ئیمتیازی نەوت کردبووی، دۆبس ڕوونیکردەوە کە لیژنەی سنوور گرنگییەکی زۆر دەدات بە وەڵامی حکومەت لەسەر ئەم پرسیارە، پاشان کاریگەری دەبێت لەسەر ڕاسپاردەکانی لیژنەی سنوور بۆ کۆمەڵەی گەلان بۆ ئەوەش داوای وەڵامی کرد بەزووترین کات[٨٣].

سەرۆك وەزیرانی عێراق ئەم نووسراوەی دۆبس و پرسیارەکانی لیژنەی سنووری وەك ئاگادار کردنەوەیەك بە دانەدەستی موسڵ بە تورکەکان لێکدایەوە، ئەگەر عێراق ڕازی نەبێت و ئیمتیازی نەوتی ئەم ناوچانە نەبەخشێت بە کۆمپانیای زلهێزەکان، بۆیە یەکسەر سەرۆك وەزیران داوای کۆبونەوە دەکات لە وەزیرەکانی، هەروەها پێش ئەم کۆبوونەوەیە نووسراوێکی تری پێگەیشت لە دۆبس، کە جارێکی تر هەڵوێستی وەزارەتی داگیرکەکان پێی ڕادەگەێنێت، کە هیچ ڕازی نیە هەموارکردنی تر بکرێت لەسەر پرۆژەی ئیمتیاز و هەردوو گرووپی فەرەنسی وئەمریکیش بڕیاری کشانەوەیان دەدەن لە کۆمپانیاکە، ئەگەر بزانن حکومەتی عێراق بەردەوامە لەسەر بەشداری پشکەکانی کۆمپانیاکە، ئەم کشانەوەیەی بە مەترسییەکی گەورەی هەژمارکرد و بە سەرۆك وەزیرانی ڕاگەیاند، ئەگەر ئەم دوو دەوڵەتە بکشێنەوە کاردەکەنە سەر ئەنجامەکانی لیژنەی سنوور لەسەر کێشەی موسڵ، بۆیە داوای لە سەرۆك وەزیران کرد، چی لە توانایدا هەیە کاری بۆ بکات[٨٤].

ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق بەوە وەڵامی دۆبسی دایەوە، کە حکومەت هیچ خوازیاری دواکەوتنی بەخشینی ئیمتیازی نەوت نییە و هیچ خاڵێکی جەوهەری نییە جێگای ناکۆکی بێت جگە لە دابەشکردنی پشکەکان، ئەویش لە بواری تاوتێکردن دایە[٨٥].

وا پێی دەچێت، کە کاتێ بڕیاری کۆتایی لەسەر بەخشینی ئیمتیازی نەوتی ویلایەتی موسڵ وبەغدا لە دەستی حکومەتی بەریتانیا بوو، نەك حکومەتی عێراق، حکومەتی بەریتانیا هەموو ئەو هەڵوێست و هەموارکردنەی بە سەرۆکی کۆمپانیای نەوتی تورکی (نیکۆلن) ڕاگەیاندووە، کە لەسەر ئیمتیازی نەوت کراوە، واپێی دەچێت حکومەتی بەریتانیا زەمانەتی لە فەرەنسا وئەمریکا وەرگرتبێت دەربارەی کێشەی موسڵ، بۆ دەستەبەری بەرژەوەندییەکانی لە عێراق لە ڕێگای ماندێتەوە، بۆیە هەوڵیدا بۆ درێژکردنەوەی ئەم گفتوگۆیانە تاکو کاتێکی دوور بە یارمەتی لیژنەی سنووری نێودەوڵەتی، لە کۆتایی مانگی شوبات دەسەڵاتدارانی بەریتانیا پـروپاگەندەیان لە عێراق بڵاوکردەوە، کەگوایە تورکیا هەوڵی بەخشینی ئیمتیازی نەوت دەدات بە ئەمریکاو فەرەنسا، بۆ ئەوەی کاربکەنە سەر کۆمەڵەی گەلان بە پێدانی موسڵ بە تورکیا[٨٦]. ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق دانیشتنێکی تایبەتی کرد لە (٥)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٥) دا و چاوی خشاندەوەبە سەر هەموو نامەگۆڕینەوەکانی نێوان حکومەتی عێراق وبەریتانیا، دەربارەی مافی عێراق لە پشکەکانی کۆمپانیا، هەموو بەیانەکانی لیژنەی سنووری موسڵ، ئەو پرسیارانەی کە پەیوەندییان بە شەرعیەتی ئیمتیاز و پەلەکردن لە بەخشینی ئیمتیازدا، لە ئەنجامی ئەو گفتوگۆیانەی لە ناو ئەنجوومەنی وەزیران هەبوون لە سەر بابەتی ئیمتیاز، لایەنی نارەزایی هەبوون بۆ بەخشین، ئەوەی زۆر گرنگ بوو موزاحەم پاچەچی، کە دەستی لە کارکێشابووەوە، یەکسەر ئەم بڕیارەی هەڵوەشاندەوە بوو بە لایەنگری بە خشینی ئیمتیاز، بەم پێیەش یاسین هاشمی توانیوویەتی لایەنگرانی بەخشینی ئیمتیاز زۆر بکات، ئەنجوومەن بڕیاری دا دەسەڵات بداتە وەزیری گواستنەوە وئەشغال تا بتوانێ ئیمتیاز مۆربکەن، دوای دەستکاری کردنی هەندێك خاڵی لاوەکی، تەنها وەزیری مەعاریف و وەزیری داد نارازیی بوون لەسەر بڕیاری ئیمتیاز و دەستیان لە کارکێشایەوە[٨٧].

لە (١٤)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٥) وەزارەتی گواستنەوەو ئەشغال کۆتایی هێنا بە خاڵە لاوەکییەکان، کە ئەنجوومەنی وەزیران ڕەزامەندی دەربڕیبوو لەسەر دەستکارییەکان، بە هاوکاری لەگەڵ نوێنەری کۆمپانیادا، ئیمتیازی نەوت لەلایەن هەریەك لە موزاحەم پاچەچی و کیلینگ لە هەمان ڕۆژدا مۆرکرا[٨٨].

دوای ئەوەی لیژنەی سنوور دڵنیا بوو لەوەی کۆمپانیای نەوتی تورکی ئیمتیازی نەوتی دەستکەوت لە ویلایەتی موسڵ، دوای پێنج ڕۆژ بڕیاریدا بە تەواوبوونی کارەکانی و گەڕایەوە بۆ موسڵ لە دوایدا بۆ جنێف[٨٩] دوای حەوت ڕۆژ لە مۆرکردنی ئیمتیازی نەوت یاسای ئەساسی عێراقیش بڵاوکرایەوە[٩٠] دوابەدوای ئەم ڕووداوە هێزە ئاسمانییەکانی بەریتانیا لە عێراق دەستیان کرد بە هێرشکردنێکی فراوان لە دژی لایەنگرانی شێخ مەحمود لە سلێمانی، تەنها بۆ ئەوەی بارودۆخ گونجاو بکەن بۆ کۆمپانیای (TPC) کارەکانی ئەنجام بدات لە ناوچەکەدا، بۆ ئەوەی بەرژەوەندییە نەوتییەکانی زلهێزەکان دڵنیا بن لە سەرمایەکانیان[٩١] چونکە مەترسییەکی گەورەیان لە شێخ مەحمود هەبوو، لەوەی ناوچە نەوتییەکانی کەرکوك و دەوروپیشتی، بکاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. ئەوەتا دکتۆر کەماڵ مەزهەر هەڵوێستێکی شێخ مەحمودی تۆمارکردووە، کەوا بەردەوام داوای نەوتی کەرکوك و ویلایەتی موسڵی بە هەموو سنوورەکەی دەکرد، دەستەواژەیەك لەسەر زاری بوو بەردەوام "نەوت نەوتی خۆمە کەس پەیوەندی پێوەنییە" کە زۆر کاریگەری هەبوو لەسەر بەریتانییەکان ولە ئەنجامدا هەموو هەوڵەکانیان خستووەتەگەڕ بۆ دوورخستنەوەی

ناوچەکانی کەرکوك لە چنگ بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردی و بە تایبەتی لە ژێر دەستی شێخ مەحمود[92] ئەوەی شایەنی باس بێت لەم بوارەدا کەسایەتی ئاینی وسیاسی وکۆمەڵایەتی بەناوبانگی کورد، وئەندامی ئەنجوومەنی تأسیسی (مەلا محەمەدی کوێی) لە بیستەکانی سەدەی بیستەم هۆنراوەیەك دەنووسێت بە ناوی (هەناسەی نەوتاوی)، کە لەناوەرۆکیدا سەرگوزشتەی ململانێی زلهێزەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی نەوتی کەرکوك دەخاتەروو، بیروباوەڕی رۆشنبیرانی کوردی ئەو سەردەمە لەسەر ئەم بابەتە نیشاندەدات[93].

ئەو رێککەوتنەی نەوت ناسراوە بە ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی لە (١٤)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٥) لەنێوان وەزیری گواستنەوەی عێراق (موزاحەم پاچەچی) و نوێنەری کۆمپانیای نەوتی تورکی (ای.هـ.کیلینگ) مۆرکرا، ئەم رێککەوتنە ٤٣ برگەی تێدابوو، لە گرنگترین ئەو خاڵانەی لەم رێککەوتنەدا هاتبوو:

١. بە رەزامەندی حکومەتی عێراق ئیمتیاز و ماف گەران و توێژینەوە و هەڵکەندن و ئامادەکردنی نەوت بۆ بازرگانی وگواستنەوەو فرۆشتنی کەرەستەی نەوتی خاو (نەوتی رەش) و گازی سرووشتی بە کۆمپانیای نەوتی تورکی بەخشرا.

٢. ماوەی ئیمتیاز ٧٥ ساڵ دەبێت لە کۆتایی ماوەی ئیمتیاز هەموو موڵکدارییەکانی گشتی کۆمپانیا ودەزگاکانی بەبێ هیچ بەرامبەرێك بۆ حکومەتی عێراق دەگەرێتەوە.

٣. ئەم رێککەوتنە سنوورەکانی ئیمتیازی دەستنیشانکرد لە عێراق بە تەنها لە ویلایەتی موسڵ و بەغدا و ناوچەکانی ویلایەتی بەسرە، بەڵام زەوییە گواستراوەکانی خانەقینی نەگرتەوە.

٤. کۆمپانیا دەست بە پرۆسەی رووپێوکردنێکی جیۆلۆجی فراوان لە ماوەی ٨ مانگ لە سێ ناوچەی هەڵبژاردراودا بکات.

٥. کۆمپانیا لە ماوەی ٣٢ مانگ راستەوخۆ دوای مۆرکردنی ئیمتیاز دەست دەکات، بە هەڵبژاردنی ٢٤ پارچە زەوی بە مەرجێك نابێت رووپێوی هەر پارچەیەك لە ٨ میل چوارگۆشە زیاتر بێت، دەست بە کارەکانی لەنێوان سێ ساڵ بکات، دوای تێپەربوونی سێ ساڵ کۆمپانیاکە ولە ماوەی ٣٦ مانگ دا بە گەران لە رووپێوی ٣٦٠٠٠ پێ وەك کەمترین رێژەیە دوای ٣٦ مانگ کۆمپانیا هەڵدەستێ بە گەران ١٢٠٠٠ پێ ساڵانە تاکو کارەکانی هێڵی بۆری نەوت تەواودەبێت بۆ سەر دەریای ناوەراست ودەبێ دەست بە کارەکانی پرۆژەی تۆری هێڵی بۆری بکرێت بە زووترین کات.

٦. حکومەتی عێراق چوار ساڵ دوای مۆرکردنی ئیمتیاز، لە هەر ساڵێك ٢٤ پارچە زەوی هەڵدەبژێرێت و رووبەری هەر پارچەیەك ٨ میل چوار گۆشە دەبێت، تەنها ئەو پارچانە ناگرێتەوە، کە کۆمپانیا لە سەرەتا بۆ خۆی مسۆگەری کردبوو، حکومەت ئەم پارچە زەوییانە دەخاتە بەردەم کۆمپانیاکانی تری جیهان بۆ وەبەرهێنانی، کۆمپانیای نەوتی تورکی ئەرکی بڵاوکرنەوەی ئەم پارچانە بڵاودەکاتەوە لە رۆژنامەکاندا لە باتی حکومەتی عێراق.

٧. کۆمپانیای (TPC) بری (٤شلن) بۆ هەر تەنێکی نەوتی دەرهێنراو بە حکومەتی عێراق دەبەخشێت وەك مافێکی حکومەت لە وەبەرهێنانی سەرچاوەکانی سامانی سروشتی بۆ ماوەی ٢٠ ساڵ، دوای ئەوە بۆ ماوەی١٠ساڵ پشکی عێراق دەخەمڵێندرێت بەپێی نرخی بازار لەوکاتەدا.

٨. کۆمپانیا دەبێت پێداویستی عێراق لە نەوت بە نرخێکی دیاریکراو و جێگیر دابین بکات.

٩. کۆمپانیای نەوتی تورکی لە بەریتانیا تۆماردەکرێت و بارەگاکانی کۆمپانیا لە عێراق لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا بێت، لەگەڵ ئەوەی ماف حکومەتی بەریتانیا دەبێت بە دامەزراندنی سەرۆکی کۆمپانیا هەموو جارێك.

١٠. ماف درا بە حکومەتی عێراق بۆ دامەزراندنی نوێنەرێك لە ئەنجوومەنی کۆمپانیا لەگەڵ ئەوەی ماف یەکسان دەبێت وەك هەموو ئەندامەکانی تر[94].

*** کاریگەری پرسی نەوت لەسەر کێشەی ویلایەتی موسڵ دا :**

دوای ئەوەی رێککەوتنی لۆزان مۆرکرا لەنێوان هاوپەیمانان و وڵاتی تورکی لە (٢٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٢٣) دا، کە کێشەی خاوەندارییەتی ویلایەتی موسڵ (کە زۆرینەی بەشی باشووری کوردستانی لە خۆگرتبوو) بەپێی مادەی سێ نەخشە رێگای بۆ دانرابوو، کە لە ناوەرۆکیدا هاتبوو: "دەستنیشانکردنی هێڵی سنوور لەنێوانی تورکیا وعێراق بە پێی رێککەوتنی ئاشتی، کە دەبەسترێت لەنێوان تورکیا وبەریتانیا لە ماوەی ٩ مانگدا، ئەگەر هەردوو وڵات لە ماوەی دیاری کراودا رێکنەکەوتن ئەوە ناکۆکییەکانی نێوانیان بەرزدەکرێتەوە بۆ ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان"[95].

بۆ ئەم مەبەستەش لە (١٩)ی ئایاری ساڵی (١٩٢٤) دا هەردوو وڵاتی بەریتانیا وتورکیا دەستیان دایە گفتوگۆکردن دەربارەی کێشەی موسڵ لە کۆنگرەیەکی تایبەت بەناوی (قۆستەنتینییە) [96] شاندی بەریتانی لەم کۆنگرەیەدا پێکهاتبوو لە سیر پرسی کۆکس و بەهاوکاری هەریەك لە کاپتن ار.اف.جاردین (R.F.Jardin)، کە پشکنەری کارگێریی بەریتانیا بوو لە موسڵ و تەها هاشمی سەرۆکی ئەرکانی سوپای عێراق بوو وەك راوێژکارێك[97] شاندی تورکی پێکهاتبوو لە سەرۆك (فەتحی بەگ سەرۆکی ئەنجوومەنی تورکیا) و ئەندامێتی هەریەك لە کازم پاشا، فەوزی بەگ، فایق بەگ، نەسرەت بەگ و سەرهەنگی سوپا ئیسحاق ئەفەندی[98] گفتوگۆ بەردەوام بوو لەنێوان هەردوو لایەن تاکو (٥)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٢٤) بێ ئەوەی هیچ ئەنجامێکی لێبکەوێتەوە، چونکە لایەنی تورکی داواکارییەکانی دووپاتکردەوە بە گەرانەوی ویلایەتی موسڵ، کە بەندبوو لەسەر هەندێك بەڵگەی مێژوویی وئەتنیکی وجوگرافی وسەربازی، کە عیسمەت پاشا لە کۆنگرەی لۆزان خستیەروو، جەخت کردنەوە لەسەر راپرسی دانیشتووانی ویلایەتی موسڵ بۆ زانینی خواستەکانیان دەربارەی چارەنووسی سیاسی ویلایەت بکاتەوە[99] هەروەها لایەنی بەریتانی هەمان داواکاری پێشکەشکرد، کە لە لۆزان پێی لەسەر داگرت، بەڵام لەوەش زیاتر پیرسی کۆکس کێشەی ئاشوورییەکانی[100] قۆزتەوە وداوای کرد، کە سنوور درێژبکرێتەوە، کە باکووری

ویلایەتی موسڵ لە خۆ بگرێت، کە ناوچەی هەکاری بگرێتەوە و لە سنووری تورکیایە[١٠١] کۆکس پشتی بەستیبوو بەو ئالۆزییانەی لەڕووی کارگێری وشۆڕشەکانی ناوخۆیی لە ناوچەکەدا ڕوویاندا بوو[١٠٢] لە بەرامبەردا شاندی تورکی هەموو داواکارییە کۆن ونوێیەکانی بەریتانیای ڕەتکردەوە، ئاماژەی کرد بەوەی لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ویلایەتی موسڵ، کە لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا دایە هەمان ناکۆکی وکێشەی هەیە، بە تایبەتی شۆڕشەکانی شێخ مەحمود[١٠٣] جارێکی تر لەم کۆنگرەیەدا لایەنی تورکی بابەتی نوێنەرانی کورد، کە نوێنەرایەتی ویلایەتی موسڵیان دەکرد لە ئەنجوومەنی نیشتمانی گەورەی تورکیا هێنایە مەیدان لەوانەش نوێنەری کەرکوک (نازم بەگ) و نوێنەری سلێمانی (فەتاح بەگ) [١٠٤] لەگەڵ ئەوەش فەتحی بەگ سەرۆکی شاندی تورکی گەیشتە ئەو قەناعەتەی، کە حکومەتی بەریتانیا بەخستنەڕووی ئەم داواکارییانە هەوڵی هەڵوەشاندنەوەی ئەم گفتوگۆیانە دەدا. بەپێی ئەم مانۆڕە سیاسییەکانی بەریتانیا لە کۆنگرەدا، کە ئامانجی ئەوە بوو گفتوگۆکان هەڵبوەشێنێتەوە بۆ ئەوەی بیگوازێتەوە بۆ گۆڕەپانی نێودەوڵەتی، چونکە قەناعەتی تەواوی هەبوو، ئەگەر ئەم کێشەیە بگوازرێتەوە بۆ پانتایی نێودەوڵەتی و بەتایبەتی کۆمەڵەی گەلان، ئەوان لە توانایاندا هەیە کۆنترۆڵی بارودۆخەکە بکەن وکۆتایی بە کێشەکە بهێنن بۆ بەرژەوەندی خۆیان ولەلایەکی ترەوە ئەوان دەیانویست لە ماوەی ٩مانگ کۆتایی بە مانۆڕ ودەستی دەستی بهێنن[١٠٥]

کۆبوونەوەی (٥)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٢٤) کۆنگرەی (قۆستەنتینییە) بێ هیچ ئەنجامێك کۆتایی پێی هات، ئەم بەرواره بە ڕۆژی کۆتایی هەژماردەکرێت کە لە ماوەی (٩) مانگدا گفتوگۆ کۆتایی پێ هات[١٠٦] لە (٦)ی ئابی ساڵی (١٩٢٤) سەرۆکی وەزیرانی بەریتانیا داواکاری لە ڕێگای وەزیری دەرەوەی ماکدۆناڵد (Henderson MacDonald) بە سکرتێری گشتی کۆمەڵەی گەلان پێشکەشکرد، کە کێشەی ویلایەتی موسڵ بخاتە ناو کارنامەی ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان بۆ ئەوەی چارەسەرێك بۆ ئەم کێشەیە بدۆزرێتەوە[١٠٧]

ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان لە دانیشتنی ژمارە (٣) لە جنێڤ بەسترا لە ڕۆژی سێ شەمە ڕێکەوتی (٣٠)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٢٤)، کە پێوەندی داربوو بە لێکۆڵینەوە لەسەر دۆسیەی سنووری عێراق، بڕیاردرا بە دامەزراندنی لیژنەیەك (دەستەیەك) بۆ کۆکردنەوەی ڕاستی وزانیاری لەسەر ئاستی سرووشتی ناوچەکە، لیژنەکە پێکهاتبوو لە فرسن (Dewirsen) سوویدی کە ڕاوێژکاری بالیۆز بوو لە ڕۆمانیا وەك سەرۆك، کونت پۆڵ تێلیکی (Teleki)، کە زانا بوو لە بواری جۆگرافیناسی، سەرۆك وەزیرانی مەجەر بوو، سێیەم ئەندام کۆلۆنیل پۆلس بوو کە ئەفسەرێکی خانەنشین بوو لە سوپای بەلژیکی[١٠٨]

ئەم لیژنەیە لە (٣١)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٤) ڕاگەیاندرا بە پێی پارسەنگی نێودەوڵەتی بەوەی ئەندامی بەلژیکی هاوپەیمانی بەریتانیا بوو لە جەنگی یەکەم جیهانی، ئەندامی مەجەری هاوپەیمانی تورکیا بوو، ئەندامی سویدی وەك بێلایەن تەماشاکرا[١٠٩] هەر لەو کاتەی لیژنە پێکهێنرا ئەندامەکان دەستیان دایە لێکۆڵینەوە لەسەر دۆسییەی بابەتی سنووری نێوان تورکیا وعێراق، هەر لە کۆنگرەی لۆزان تاکو کۆنگرەی قۆستەنتینیە. لیژنە پلانی تایبەتی کارکردنی دانا وبڕیاری کۆتاییدا بەوەی بەرەو ناوچەکانی ناکۆکی بڕۆن بۆ لێکۆڵینەوە وکۆکردنەوەی زانیاری، بەڵام پێش ئەوە سەردانی هەردوو دەوڵەتی بەریتانیا وتورکیای کرد، لە (٢٠)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٤) لیژنە گەیشتە بەریتانیا وچاوی کەوت بە وەزیری دەرەوەو وەزیری داگیرگەکانی بەریتانیا، داوایان کرد، کە حکومەتی بەریتانی یاریدەرێك بۆ هاوکاری کردنی لیژنە لە ناوچە ناکۆکەکان لەگەڵیان بێت، لیژنە لە (٣)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٥) گەیشتە ئەستەنبوڵ و نیازی ئەنقەرەشیان هەبوو[١١٠] حکومەتی تورکی لەسەر داواکاری لیژنە (جواد پاشا)، کە پشکنەری سوپای گشتی بوو، لە ناوچەی دیاربەکر لەگەڵ سێ لە پسپۆڕ (کامیل بەگ لە موسڵ، نازم بەگ لە کەرکوك وفەتاح بەگ لە سلێمانی) وەك تیمی یاریدەر وهاوکاری لیژنە، دامەزارن[١١١]

لە (١٦)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٥) دا لیژنەی سنووری گەیشتە بەغدا، بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان لەسەر پەیوەندییە ئابوورییەکانی نێوان ویلایەتی موسڵ وبەغدا، ماوەیەکی زۆر لەلای دۆبس مانەوە، سەبیح نەشئەت وەزیری پێشووی ئەشغالی عێراقی وەك یاریدەری ئەندامی دامەزراوی بەریتانیا (مستر جاردین) دانرا، لە ڕۆژی دواتر لیژنە چاویان بە شا فەیسەڵ کەوت، کە خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بەگەیشتنی لیژنە بۆ بەغدا[١١٢] یاسین هاشمی سەرۆك وەزیرانی عێراق نانخوانێکی گەورەی لە (٢٥)ی کانوونی دووەم بۆ پێشوازیکردنی لیژنەکە سازکرد وزۆربەی بەرپرسەکانی بەریتانی وعێراقی ئامادەبوون[١١٣]

(لیژنەی سنوور) لە بەغدا بەرەو شاری موسڵ بەڕێکەوت لە ڕۆژی (٢٧)ی کانوونی دووەم گەیشتنە موسڵ، دەستیان کرد بە هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە[١١٤] هەروەها لیژنە دەستیکرد بە گەشتکردن بە ناوچەی ناکۆکی دوای ئەوەی لە (١١)ی شوباتی ساڵی (١٩٢٥) بۆ چوار دەستەی لاوەکی دابەشبوون، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. فرسن وجواد پاشا ومستەر جاردین لە موسڵ مانەوە وەك بارەگای سەرەکی، سەردانی گوندەکانی دەوروپشتیان کرد (سنجار، مەخمور، تەلعفەر و ئاکرێ).

٢. کونت تیکلی ونازم بەگ حاکمی سیاسی بەریتانیا مستەر لیون سەردانی هەولێر وشەقڵاوە وهۆزەکانی دەوروپشتیان کرد.

٣. کۆلۆنیل پۆلس وسەبیح نەشئەت وکامل بەگ پرۆسەی پشکنینیان ئەنجامدا لەناوچەکانی کەرکوك ودەوروپیشتیدا.

٤. مستەر بورتالیس، کە ئەندامێکی تری لیژنە بوو ناوچەکانی چیای حەمرین وکفری وهۆزەکانی ئەم ناوچەیەیان بەسەرکردەوە[١١٥]

لە (٢٥)ی شوبات هەموو ئەندامانی لیژنە کۆبوونەوە لە شاری کەرکوك بۆ ئەوەی ئامادەبن بۆ سەردانی شاری سلێمانی و لە (٢٧) شوبات بەرەو سلێمانی بەڕێککەوتن، کە بە ترسێکی زۆرەوە لەلایەن دەسەڵاتی بەریتانیا وحکومەتی عێراق

چاوەڕوانی ئەنجامەکانی سەردانی لیژنەیان دەکرد لە شاری سلێمانی، چونکە پێگەی مەلبەندی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد بوو بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود، ئەم مەترسییەی بەریتانیا وحکومەتی عێراقی زۆر بە ئاشکرا لەسەر زاری ئەفسەری سیاسی بەریتانیا (سیسیل.جی. ئەدموندس) هاتبوو، کە هاوڕێیەتی لیژنەکەی کرد بۆ شاری سلێمانی[116].

مەترسییەکانی حکومەتی عێراق ودەسەڵاتدارانی بەریتانی تا ئاستێك بەرز ببووەوە، کە پێش گەیشتنی لیژنە بۆ ناوچەکانی باشووری کوردستان و بەتایبەتی سلێمانی، چەندین کاری پێشوەختیان ئەنجام دابوو بۆ ڕاکێشانی سۆزی دانیشتووان بۆلای خۆیان[117] بەرپرسی عێراق عەبدولموحسین سەعدوون) و مێجەر بولی ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق ولۆرد تۆمبسۆن وەزیری فڕۆکەوانی بەریتانیا سەردانی سلێمانی دەکەن پێش گەیشتنی لیژنە، ئامادەیی حکومەتی عێراق نیشان دەدەن بە گرنگی دان بە ناوچە کوردییەکان[118]. هێنری دۆبس لە (١٦) تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٤) سەردانی شاری سلێمانی دەکات[119].

لە ڕاستیدا بەریتانییەکان هەوڵیاندا، کاتێك لیژنە گەیشتە ناوچەکانی کوردستان، مەرامەکانی خۆیان جێبەجێبکەن، ئەوانە بە ئەندامانی لیژنەیان ڕاگەیاندبوو: "هەرچەندە زۆرینەی دانیشتووانی ئەم ناوچەی ویلایەتی موسڵ کوردن، بەڵام زۆرینەیان ساویلکەن و ناتوانن خواستەکانی خۆیان بخەنەروو"، بەریتانییەکان هەوڵیاندا، کە هیچ پەیوەندی ونزیك بوونەوەیەك لەنێوان ئەندامانی لیژنە ونوێنەرانی ڕاستەقینەی کورد بە تایبەتی شێخ مەحمود نەکرێت[120].

کارەکانی لیژنەش لەم ناوچانە هەر بە خواستی بەریتانییەکان بوو. ئەوەتا پرۆسەی ڕاپرسی هەر پیاو ماقوڵانی شارو شارۆچکەکان وسەرۆك خێڵ وعەشرەت وموختارەکان بەشداریان تێداکردبوو، ڕاپرسییەکە بریتی بوو لەو پرسیارەی: ئایا دەتانەوێت ویلایەتی موسڵ بەشێك بێ لە عێراق یان تورکیا؟[121] هەروەها لیژنە هیچ بیروبۆچونێکی تۆمارنەکرد، کە لایەنگری سەربەخۆیی بێت، بەڵام تەنها ئەو بۆچوونانەی تۆماردەکرد، کە لایەنگری یەکێك لەو دوو دەوڵەتە نۆییە هاتبوو لە پرسیارەکەدا[122].

لەلایەکی تردا و وەك دکتۆر فازیل حوسێن لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەی دەربارەی کێشەی موسڵ دەڵێت:

"نەوت وەك فاکتەری براوە کۆتایی بە کێشەی موسڵ هێنا"[123] بۆیە نەوتی باشووری کوردستان و بەتایبەتی نەوتی کەرکوك پەیوەندییەکی فراوانی دەبێت هەر لە سەرەتای دامەزراندنی لیژنەی سنوور و دەست بەکاربوونیان لە لێکۆڵینەوەی لەسەر کێشەی موسڵ لەسەر گۆڕەپانی ناکۆکیکردن تاکو کاردانەوەی لەسەر بەخشینی ئیمتیازی نەوت، لەم ناوچەیە لەگەڵ ناوچەکانی تری عێراق بە کۆمپانیای (TPC) دا، تەنها بە چارەنووسی یەك لاکەرەوەی ئەم ناوچانە ئیمتیازی نەوت دەبەخشرا بە کۆمپانیایەك، کە زۆربەی زۆری زلهێزەکان بەشداربوون تێیدا، بۆیە جێگای گومان نیە وەك نووسەری کتێبی" گەرانی بەریتانیا بە دوای نەوتدا، عێراق ١٩١٠-١٩٢٨"، دەڵێت:

"تەنانەت دامەزراندنی لیژنەی دەستنیشانکردنی سنووری نێوان تورکیا وعێراق بە تاکتیکی بەریتانیا ورۆڵ ودەست تێوەردانی لۆرد کرزنی لەسەر بوو"[124].

لەو کاتەی لیژنەی سنووری دەگاتە ناوچەی ناکۆکی، نوێنەری کۆمپانیای (TPC) (کیلینگ) زۆر خۆش حال بوو، کاتێکی باش بوو بۆ هێنری دۆبس، کە بیر بکاتەوە بۆ دواکەوتنی دەستووری هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی تأسیسی عێراقی، لەو کاتەی لیژنە سنوور لە بەغدا بوون زکائی بەگ (Zekiai) باڵیۆزی تورکی لە لەندەن ووتوێژ لەگەڵ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا (چێمبرلن) دەکات لە (٢٠)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٥) هەندێك ئیمتیازی ئابووری بۆ بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا خستەروو بەرامبەر بە پێدانی موسڵ بە تورکیا، بۆیە چێمبرلن ئەم فرسەتەی قۆزتەوە بۆ لاواز کردنی هەڵوێستی تورکیا لە کۆمەڵەی گەلان، داوای دڵنیابوونی لە زکائی بەگ دەربارەی هەڵوێستی حکومەتی تورکیا لەسەر ئەم پێشنیازە، بۆیە حکومەتی تورکی پرۆژەیەکی ڕێککەوتنی ڕێکخست، کە ڕێگا دەدات بە هەر کۆمپانیایەکی بەریتانی کە خوازیاری ئیمتیازی نەوتی ناوچەکانی ویلایەتی موسڵ بێت، کە دەکەوێتە چوارچێوەی تورکیاوە، مافی دامەزراندن و بەڕێوبردنی بەندەرەکان و هێڵی ئاسنی پێوەست بۆ ئەم پرۆژەیە.

ڕۆژنامەکان باسی باشکردنی پەیوەندییەکانی بەریتانیا وتورکیا یان کرد، لەگەڵ ئەوەی ئینگلیزەکان باسی ئەوەیان دەکرد، کە تورکەکان ئیمتیازێکی ئابووری گەورەیان پێشکەشکردوون، کە لە ناویدا ئیمتیازی نەوتی تێدایە[125].

لە (١٩)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٥) حکومەتی تورکی پێشنیازی بەستنی پەیمانێك دەخاتە بەردەم بەریتانیا، کە لە ڕێگای ئەم پەیمانەدا، تورکیا ئیمتیازێکی گرنگ دەبەخشێت بە کۆمپانیای بەریتانی بۆ پەرەپێدانی نەوتی ویلایەتی موسڵ وراکێشانی تۆڕی بۆری بەناو خاکی تورکیا و دامەزراندنی هێڵێکی ئاسنی بەدرێژای ٣٠٠٠کم و چەندین ئیمتیازی تر بەرامبەر بەوەی بەریتانیا دەست لە موسڵ هەڵگرێت بۆ بەرژەوندی تورکیا[126].

مێژوونووسی عێراقی (عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی) دەڵێت:" لەوکاتەی لیژنەی سنووری نێودەوڵەتی گەیشتە موسڵ لە ڕۆژی (٢٧)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٥) پرسیاری لە دانیشتووانی ویلایەتی موسڵ کرد، بۆ حکومەتی عێراقی ڕوون بووەوە، کە کۆمەڵەی گەلان ڕێگا نادا بە هێشتنەوەی ویلایەتی موسڵ لە چوارچێوەی عێراق دا ئەگەر ئیمتیازی نەوت نەبەخشرێت بە کۆمپانیای نەوتی تورکی بە تایبەتی لەو کێڵگە نەوتییانەی لە ناوچە جێناکۆکەکاندان (ویلایەتی موسڵ)..."[127].

مێژوونووسی یۆگسلاڤ پرۆفیسور (ڕادۆڤان پاڤیچ) لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی دا دەربارەی جوڵانەوەی ڕزگاریخوازانەی کورد، کێشەی یەکلاکردنەوەی ویلایەتی موسڵ بە بوونی نەوتەکەی گرێدەدات، دەڵێت:" ئەو لیژنەیەی کۆمەڵەی گەلان پێکیهێنابوو چاوەڕوانی ئەو مشتومڕەی لەسەر مەسەلەی نەوتی موسڵ وکوردستان دەکرا (لەلایەن

زلهێزەکان) بەلایەکدا بخات وچارەسەری بکات"[١٢٨].

هەندێك سەرچاوە ئاماژە دەکەن بەوەی لە سەرەتاوە دەست تێوەردان هەبوو لەناو لیژنەی سنووری نێودەوڵەتیدا، بە تایبەتی لە ژێر کاریگەری هێنری دۆبس و کۆمپانیای (TPC)، ئەوەتا سەرۆکی لیژنەی سنووری کۆنت تێلیکی ناوبژیوانی و یارمەتی پێشکەش کردووە لەنێوان کۆمپانیای (TPC) و حکومەتی عێراق لە دانشتینێکی داخراودا لە (٢٦)ی شوباتی ساڵی (١٩٢٥) [١٢٩] وەزیرەکانی عێراقی دڵنیاکردۆتەوە لەوەی موسڵ بۆ عێراق دەبێت ئەگەر ئیمتیازی نەوت ببەخشن بە کۆمپانیا.

لە (٢)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٥) کۆنت پۆل تێلیکی لەو کاتەی لەگەڵ لیژنەی سنوور لە بەغدا بوون بە هێنری دۆبسی گوتبوو هەموو هەوڵەکان بخاتە گەڕ بۆ قەناعەت هێنان بە وەزیرە عێراقییەکان، وەهانیان بدات ئیمتیازەکە مۆربکەن، پۆلس ئەندامێکی تر بوو بە ساسۆن حسقێل وەزیری دارایی عێراقی ڕاگەیاندبوو: "هەر لایەنێك لە عێراق یاخود تورکیا دەست پێشخەری بکات بەبەخشینی ئیمتیازی نەوت بە کۆمپانیای (TPC)، ئەوا ولایەتی موسڵی دەست دەکەوێت"[١٣٠] پۆلس زانیارییەکی فراوانی هەبوو لەسەر کەرەستەی نەوت، چونکە خاوەندارێیەتی هەندێك بەرژەوەندی بوو لە نەوتی ڕۆمانیا، هەروەها لێکۆڵینەوەیەکی ووردی کردبوو بۆ ئەو هێڵە بۆرییە، کە بەتەمابوو کۆمپانیا (TPC) دروستی بکات بۆ گواستنەوەی نەوتی ولایەتی موسڵ وناوچەکانی تر بۆ سەر دەریای ناوەڕاست. لەلایەکی ترەوە سۆزی لایەنگری کۆمپانیای (TPC) بوو لەم بارەیەوە دەڵێت: "هیچ گرووپێکی تر نییە لە بواری نەوتدا لە جیهاندا بە قەدەر کۆمپانیای (TPC) توانای وەبەرهێنان وپەرەپێدانی نەوتی ویلایەتی موسڵ مسۆگەر بکات، چونکە تەنها هێڵی بۆری گواستنەوەی نەوتی ئەم ناوچەیە خەرجێکی زۆری دەوێت، کە یەك پێ لەم پرۆژەیەدا بری یەك پاوەنی دەوێت"[١٣١] لیژنە پێوەندی تەواوی هەبوو وکاری دەکرد بە لێك تێگەیشتنی گونجاو لەگەڵ (دار الاعتماد) هێنری دۆبس ئەم دەست تێوەردانەی لیژنەی بەکاردەهێنا بۆ ناچارکردنی حکومەتی عێراق بەوەی دەست هەڵگرێت لە مەرجی بەشداربوون لە کۆمپانیا وەك دەستپێکێك بۆ بەخشینی ئیمتیاز لەکاتی گونجاودا[١٣٢].

لەو کاتەی هێنری دۆبس فشاری دەخستە سەر حکومەتی عێراقی، لیژنەی سنووریش لەلایەنی خۆیەوە فشار دەکات لەسەر بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا وفەرەنسا کە بەشداری بکەن لە کۆمپانیای (TPC)، هەرەشەی دەکرد بە دابەش کردنی ویلایەتی موسڵ لەنێوان عێراق وتورکیا، داواشی کرد، کە ئەوانیش لە ڕێگای خۆیانەوە فشار بخەنە سەر حکومەتەکانی خۆیان بەوەی پشتی لایەنی بەریتانیا بێت، چونکە لەم جۆرە بەرژەوەندییەدا باشتر وایە مامەڵە لەگەڵ یەك دەوڵەتدا بکرێت، کە ڕۆژهەڵات متمانەی پێی هەبێت نەك لەگەڵ دوو دەوڵەتدا. لە ناوەڕۆکی ئەم پێشنیازەی لیژنەدا بەم شێوەی هاتووە: "ئەگەر هەردوو دەوڵەتی عێراقی وتورکی ڕێککەوتن، پێش ئەوەی لیژنە ڕاسپاردەکانی خۆی پێشکەش بکات لەسەر ئەوەی ئیمتیاز ببەخشێت بە کۆمپانیای (TPC) لە هەردوو ولایەتی موسڵ وبەغدا، هەرچەندە پەیوەندی بەعێراق و ویلایەتی موسڵەوە هەیە، ئەوەندەش پەیوەندی بە تورکیاوە هەیە، بۆیە لیژنە وادەبینێت، کە بەرژەوەندییە نەوتییە گەورەکان هیچ کاریان پێ ناکات لەوکاتەی سنوور دەستنیشان دەکرێت، چونکە ئەو ئیمتیازی خۆی لە هەردوو ویلایەت وەرگرتووە، بەڵام لەو کاتەی عێراق نەگیشتە بریارێك تەنها لەدوای دەستنیشانکردنی سنوور وپێدانی بەشێك لە ویلایەت بە تورکیا، بەوپێیە عێراق لەوکاتەدا تەنها دەتوانێت ئیمتیازی ببەخشێت بەو بەشەی لەویلایەتی موسڵی پێدراوە، یاخود لە ویلایەتی بەغدا، بۆ کۆمپانیاکانی تر، کە بتوانێت پلانەکانی کۆمپانیای (TPC) هەڵوەشێنێتەوە، چونکە تاکو ئێستا عێراق ئیمتیازی نەبەخشیووە، بۆیە لیژنە وا هەست دەکات، کە بەرژەوندییە نەوتییەکانی نێودەوڵەتی پێکدادەچن، کە ویلایەتی موسڵ وبەغدا بخرێنە ژێر دوو ئیدارەی جیاواز یاخود ویلایەتی موسڵ دابەشبکرێت لەنێوان عێراق وتورکیا"[١٣٣].

هێنری دۆبس ئەم پێشنیازەی لیژنەی بەمەترسی زانی، بۆیە داوای لە وەزارەتی داگیرگەکان کرد، کە فشار بخەنە سەر عێراق بۆ دانانی دەستەواژەیەك لە ناو پرۆژەی ڕێککەوتنی ئیمتیازەکە بەم شێوەیە (هەر ئیمتیازێك هەڵدەوەشێتەوە لەو کاتەی، کە هەموو بەشەکانی ولایەتی موسڵ نەدرێت بە عێراق بەپێی بریارێك لە کۆمەڵەی گەلانەوە دەربچێت)، چونکە بە باوەری دۆبس خستنە ناوەوەی ئەم دەستەواژەیە باشترین ڕێگایە بۆ ڕێگەگرتن لە تێلیکی بە پێشکەشکردنی پێشنیازی دابەشکردنی ویلایەتی موسڵ، ڕێگا دەگرێت لە کۆمەڵەی گەلان بە قبوول کردنی ئەم جۆرە پێشنیازە، چونکە وادیاربوو ئەم جۆرە دابەشکردنەی ویلایەتی موسڵ، کە بەشی ڕاستی لە ڕووباری دیجلە بە عێراق و بەشی چەپ بە تورکیا دەدرێت، ئەوا عێراق ناتوانێت نەوت هەناردە بکات بۆ سەر کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست[١٣٤].

وەزارەتی داگیرگەکان هەرەشەی لەبەرژەوندییەکانی ئەمریکا وفەرەنسا کرد کە بەشداری کۆمپانیای (TPC) بوون، کە ناتوانن عێراق ناچار بکەن بەوەی دەستهەڵگرێت لە بەشداربوونی کۆمپانیا، ئەگەر هەردوو حکومەتی ئەمریکاو فەرەنسا پشتگیری مافەکانی عێراقیان لە ویلایەتی موسڵ نەکرد، وەزارەتی داگیرگەکان بۆ ئەوەی هەرەشەکەی بێنێتەدی لە (٢٧)ی شوبات، کۆمپانیا بە جۆرێك دەستکاری کرد لە پرۆژەی ئیمتیاز بە پێدانی عێراق پشکێك لە کۆمپانیا بە شێوەیەکی کاتی[١٣٥].

وەك دیار بوو لیژنە ئەو ئەرکە سەرەکییانەی، کە کۆمەڵەی گەلان پێی ڕاسپاردبوو، لە دەست دابوو لە جیاتی ئەوەی سنوور دەستنیشان بکات و خواستی گەلانی ئەم ناوچەیە بگەیەنێتە کۆمەڵەی گەلان، دەستی خستبووە ناو بەرژەوەندییە نەوتییەکانی ئەم ویلایەتەوە، کە زلهێزەکان ململانێیان بوو لەسەری.

لیژنەی سنوور هەموو کارەکانی خۆی تەواو کردبوو، بەڵام چاوەڕوانی بریاری حکومەتی عێراق بوو بۆ بەخشینی ئیمتیازی نەوت بە کۆمپانیای (TPC) لە (١٤)ی ئاداری

ساڵی (١٩٢٥)، دوای ئەوەی فشارو هەڕەشەکانی خۆی خستە سەر حکومەتی عێراق بە پلەی یەکەم وحکومەتی تورکی بەپلەی دووەم، لیژنە لە (١٨)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٥) گەڕایەوە بۆ شاری موسڵ بۆ تەواوکردنی کارەکانی خۆی و شاری موسڵی بە جێهێشت لە (٢٠)ی نیسان بەرەو جنیف بەڕێککەوت ودەستی دایە ئامادەکردنی ڕاپۆرتی فراوان دەربارەی کێشەی موسڵ[١٣٦] ڕاپۆرتی لیژنە هەموو بیروبۆچوونەکانی لایەنی تورکی وبەریتانی دەربارەی هەموو ئەوکێشانەی پەیوەندییان بە ویلایەتەوە هەبوو، لەلایەنی ئابووری وجوگرافی وسیاسی وئەتنیکی وژمارەی دانیشتووان لە ناوچەکەدا، توێژینەوە یەکی فراوانی دەربارەی هەموو بەڵگەو بیروبۆچوونەکان خستەڕوو[١٣٧].

لە (١٦)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٢٥) لیژنە ڕاپۆرتی خۆی پێشکەش بە ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان کرد دەربارەی چۆنیەتی دیاریکردنی پاشە ڕۆژی ویلایەتی موسڵ، لەگەڵ ئەوەش، کە لیژنە گەیشتە ئەو قەناعەتەی، کە ئەگەر بێت و بەرژەوەندی دانیشتووانی ناوچەکە ڕەچاو بکرێت، کە بێگومان زۆربەی زۆری کورد بوون پێویستە حکومەتێکی کوردی دامەزرێت، دوای ئەوەی لیژنەکە گەڕایەوە سەر بەڵگە مێژووییەکان و جوگرافی ناسانی پێشتر، گەیشتە ئەو بڕوایەی هیچ کاتێك عێراق لە هیت، تکریت، یاخود ناوچەی چیای حەمرین تێنەپەڕیوە...هەروەها ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم ناوچەیە بەشێك نەبووە لە عێراق[١٣٨] بەڵام بڕیاری کۆتایی لە ڕاپۆرتەکەدا پێچەوانەی قەناعەتیان بوو، پێشنیاز کرابوو ویلایەتی موسڵ بخرێتە ژێر چاودێری (ماندێتی) بەریتانیا بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ، دابەشکردنی ویلایەتی موسڵ لەنێوان عێراق وتورکیا ڕەتکردەوە، لەلایەکی ترەوە پێشنیازی ئەوەش کرابوو، کە بەڕێوەبردنی کاروباری کارگێڕی و دادپەروەری وپەروەردەیی بە دەستی کورد بێت وزمانی کوردی زمانی فەرمی بێت لە ناوچەکەدا[١٣٩] بەڵام پێش تەماشاکردنی ڕاپۆرتەکە لەلایەن ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان، شۆڕشێکی چەکداری لە باکووری کوردستان بە سەرۆکایەتی شێخ سەعیدی پیران وهاوکارانی دژ بە حکومەتی ئەتاتورك هەڵگیرسا، بۆیە یەکسەر ئینگلیزەکان شۆڕشی کوردی باکووریان قۆستەوە و داوایان لە کۆمەڵەی گەلان کرد (هێڵی برۆکسێل) [١٤٠] بکرێتە سنووری هەمیشەیی لەنێوان تورکیا ویلایەتی موسڵ[١٤١].

لە (٢١)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٥) دادگایی دادی نێودەوڵەتی ڕای خۆی لەسەر بڕیارەکەی کۆمەڵەی گەلان دەرکرد، کە بڕیارێکی یەکلاکەرەوە بێت بۆ جێبەجێکردنی لەسەر هەردوو لایەنی ناکۆك[١٤٢].

لە (١٦)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٢٥) ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان بە کۆی دەنگ ڕازیبوون لەسەر بڕیارێك، کە لە چوار بەند پێکهاتبوو بۆ لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە دەوڵەی عێراق:

١. جێگیرکردنی هێڵی برۆکسێل وەك سنوورێکی فەرمی لەنێوان عێراق وتورکیا.

٢. پێویستە حکومەتی بەریتانیا ئاگادار بکرێتەوە بۆ پێشکەشکردنی پەیمانێکی نوێ لەگەڵ عێراق، کە بەردەوامی سیستەمی ماندێتی بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ دابینبکات، وەکو لە ڕێککەوتنامەی هاوکاری نێوان بەریتانیاو عێراقدا دیاری کراوەو هەروەها ئەو بەڵێنەی حکومەتی بەریتانیا، کە ئەنجوومەن لە (٢٧)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٢٤) داپەسەندی کرد بەو مەرجەی بەپێی خاڵی یەکەمی پەیڕەوی کۆمەڵە، عێراق تا کۆتایی ئەو ماوەیە لە کۆمەڵەدا وەرنەگیرێت، هەر کاتێکیش لە ماوەی شەش مانگدا، لە (١٦)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٢٥)ەوە ئەنجوومەن ئاگادار کرایەوە لە جێبەجێکردنی ئەو مەرجە، پێویستە ئەنجوومەن رایبگەیەنێت، کە بڕیارەکەی کۆتاییەو هەنگاوی پێویست بنێت بۆ مسۆگەرکردنی داڕشتنی هێڵی سنوور بەسەر زەویدا.

٣. لەسەر حکومەتی بەریتانیایە، کە بەرنامەی پێویست بۆ دابینکردنی مافە ئیدارییەکانی کورد پێشکەش بە ئەنجوومەن بکات.

٤. حکومەتی بەریتانیا کارە پێویستەکان بۆ جێبەجێکردنی ڕاسپاردەکانی لیژنە، ئەنجامدەدات[١٤٣].

دوابەدوای ئەم بڕیارە هەردوو حکومەتی بەریتانیا وعێراق پەیمانێکیان مۆرکرد لە (١٣)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٢٦) بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان، ئەم پەیمانەش ماوەی ماندێتی کردە چوار ساڵ[١٤٤].

بەپێی ئەم بڕیارەی کۆمەڵەی گەلان، کە لەسەر ڕاسپاردەکانی لیژنەی سنووری نێودەڵەتی دەرچوو بوو، هێڵی برۆکسێل کرا بە هێڵێکی فەرمی نێودەوڵەتی بۆ دەستنیشانکردنی سنوورێکی فەرمی نێوان عێراق وتورکیا کە دووبەشی کوردستانی دابەشکرد لەنێوان دوو دەوڵەتی نوێی تازە دامەزراودا، بە پێی ئەم بڕیارە، عێراق بە سنووری تازەی، کە هەرسێ ویلایەتی بەغدا وبەسرە وموسڵ لە خۆدەگرت، خرایە ژێر ماندێتی بەریتانیاوە[١٤٥].

هەرچەندە بڕیاری کۆمەڵەی گەلان وەك دادگای نێودەوڵەتی ئاماژەی پێکردبوو، کە بڕیارێکی یەکلاکەرەوەیە، پێویستە لەسەر لایەنە ناکۆکەکان پابەندبن پێوەی، بەڵام تورکیا هیچ دانی بەم بڕیارە نەنا، کە ئەویش لکاندنی ویلایەتی موسڵ بوو بە عێراقەوە تاکو لە (٥)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٢٦) پەیمانێکی سێ قۆڵی لەنێوان بەریتانیا وعێراق وتورکیا مۆرکرا لە ئەنقەرەوە چووە ناو بواری جێبەجێکردنەوە.

لە (١٨)ی تەمووزی ساڵی (١٩٢٦) تورکیا هەموو بڕیارەکانی ئەنجوومەنی گەلانی پەسەندکرد[١٤٦] لە ناوەڕۆکی ئەم پەیمانەدا هاتووە، کە تورکیا دان دەنێت بە لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە دەوڵەتی عێراق بەرامبەر بە: (چەند گۆڕانکارییەکی بچووك لە هێڵی برۆکسێل بکرێت، هەروەها پشکی ١٠٪ لە داهاتی عێراق، کە دەستی دەکەوێت لە نەوتی ویلایەتی موسڵ لە کاتی پەرەپێدانی ئەم کێڵگانە لەلایەن کۆمپانیای نەوتی تورکی بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ بە پێی ئیمتیازی نەوتی لە (١٤)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٥) [١٤٧] هەروەها ڕاپەراندنی چەند کارێکی ئاسایشی لەسەر سنووردا، لەگەڵ ڕێگا نەدان بە گەڕانەوەی ئەو ئاشووریانەی تورکیا، کە لەکاتی جەنگی

یەکەمی جیهانی، جێیان هێشتبوو[148].

بۆیە بەپێی ئەو بڕیارەی لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە لە (١٦)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٢٥) سەبارەت بەپێوەلکاندنی ویلایەتی موسڵ بە دەوڵەتی عێراقەوە دەرچوو، لە ئەنجامی ڕێککەوتنی هەردوو لایەنی سەرەکی ناکۆکی بەریتانیاو تورکیا، بەڵام پرسیار ئەوەیە ئایا ئەو پاڵنەرانە چی بوون وایان لە تورکیا کرد دەستهەڵگرێت لە ویلایەتی موسڵ؟ تورکیا لە کاتی لۆزان تاکو بڕیارەکانی ئەنجوومەنی گەلان بۆ لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراق دووپاتی دەکردەوە، کە داواکردنی موسڵ هۆکاری نیشتمانی و ئابووریی و مێژوویی و ستراتیژیی و سەربازیی دەستنیشانی هەڵوێستی تورکیا بوو، بەڵام تورکەکان هەستیان کردبوو بەوەی بەریتانییەکان لە ئەنجامی بڕیاری ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان سەرکەوتوون بە لکاندنی موسڵ بە عێراق، ڕێگایان بۆ خۆیان خۆش کرد، تاکو ئەندامێتی کۆمەڵەی گەلان مسۆگەر بکەن، هەروەها بڕێك لە داهاتی نەوتی ویلایەتی موسڵ بەخشرا بە تورکیا لە پەیمانە سێ قۆڵییەکەدا[149].

بەریتانیا دەستی هەڵگرت لەو بەڵێنانەی لە ڕێککەوتنی سیڤەر هاتبوو، کە بڕیاری دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ و باکووری میزۆپۆتامیا درابوو بەرامبەر بەوەی تورکیا دەستهەڵگرێت لە بە شێکی گەورەی خواستەکانی لە ویلایەتی موسڵدا، لە کاتی وتوێژەکانی لۆزان، پەیمانی سێ قۆڵیدا[150] بەڵام باشترین بەڵگەی دەستهەڵگرتنی تورکیا لە ناوەڕۆکی پەیمانی سێ قۆڵی دەردەکەوێت لە بەشی سێیەمی مادەی (١٤) بڕگەی (ا، ب، ج) هاتووە، کە تورکیا دەستی هەڵگرت لە مافەکانی لە ویلایەتی موسڵ لە بەرامبەر پێدانی بڕی (١٠٪) داهاتی حکومەتی عێراق لە نەوتی ویلایەتی موسڵ کە بە پێی ئیمتیازی (١٤)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٥) درابوو بە کۆمپانیای نەوتی تورکی[151] لە ڕاستیدا گرنگی سامانی نەوتی پاڵنەرێکی سەرەکی بوو لە دەست هەڵگرتنی تورکیا لە ویلایەتی موسڵ[152] هەروەها پاڵنەری یەکەم بوو لە پشت هەوڵەکانی بەریتانیا بۆ لکاندنی موسڵ بە دەوڵەتی عێراقەوە[153].

* ئەنجام:

* بەریتانییەکان هەوڵێکی زۆریاندا، تاکو توانیان لە (١٤)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٥) ئیمتیازی نەوتی ئەم ناوچانە مسۆگەر بکەن لە ڕێگای حکومەتی عێراقەوە بۆ کۆمپانیای (TPC)، کە خاڵی ڕێککەوتنی جۆرێك لە جێبەجێکردنی سیاسەتی دەرگای کراوەی پێوە دیار بوو. بۆ پشتیوانیکردنی یاسایی لەم ئیمتیازە، کۆمپانیای (TPC) هەوڵەکانی خستەگەر بۆ لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەدەوڵەتی عێراقەوە، ئەمەش بەپێی بڕیاری ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان لە (١٦)ی کانوونی یەکەم ساڵی (١٩٢٥) دا، بۆ ئەوەی حکومەتی عێراقی بکاتە خاوەنی ئەم ناوچە نەوتیانە و جۆرێك لە شەرعیەتی یاسایی ببەخشێت بە ئیمتیازی کۆمپانیای (TPC)، لەبەر ئەوەی ئەم گۆرانکارییە نوێیانە لە پرسی نەوتی ویلایەتی موسڵ ڕێگا ئاسان دەکەن بۆ بەریتانییەکان و کۆمپانیای (TPC) بۆ بەشداریکردنی تەواوی زلهێزەکان و دەستپێکردن بە پرۆسەی دۆزینەوە ودەرهێنانی نەوت لەناوچەکەدا.

* لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە دەوڵەتی عێراقی عەرەبی بەپێی بڕیارێکی نێودەوڵەتی، پەردەی لەسەر مافەکانی گەلی کورد داخست، تاقە هۆکاریش بەرژەوەندییە نەوتییەکانی زلهێزەکانی ئەو سەردەمە بوو، کە لە چوارچێوەی کۆمپانیای نەوتی تورکی دابوو، بەپێی ئیمتیازی (١٤)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٥) ماف پەرەپێدانی کێڵگە نەوتییەکانی (کەرکوك وناوچەکانی تری باشووری کوردستان) لەگەڵ ویلایەتی بەغدای پێدرابوو، بۆیە بەرازیکردنی عێراق بە (٤ شلن) لە نەوتی باشووری کوردستان و بڕی ١٠٪ ئەم (٤ شلن) ە بۆ تورکیا، تەنها بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانی زلهێزەکان دەستەبەربکرن لەم ناوچەیەدا، بۆ ئەوەی گۆڕەپان بۆ کۆمپانیای نەوتی تورکی پاك بکرێتەوە، دوای ئەوەی لایەنە ناکۆکەکانی بەشداربووی کۆمپانیا ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کاتی ئەوە هاتووە بۆ دەستپێکردنی کارەکانی کێوماڵکردن ورووپێوکردنی جیۆلۆجی ولێدانی بیری نەوت.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

(١) دور احتكار النفط الدولي في العراق (وهو الفصل الرابع من تقرير لجنة التجارة الاتحادية الاميركية عن احتكار النفط الدولي)، مطبعة الرابطة، بغداد، ١٩٦٠، ص ١٩.

(٢) عبدالحميد العلوجي وخضير اللامي:الاصول التأريخية للنفط العراقي، ج٢، بغداد، ١٩٧٥، ص ص٨٧-١٠٠.

(٣) ساسۆن حسقێل: یەکێك بوو لە بەناوبانگترین سەرکردە سیاسی ودبلۆماسییەکانی عێراق، لە ١٨٦٠ لەدایکبووە لە بنەماڵەیەکی جوولەکەی بە ناوبانگی عێراقی، خوێندنی لە ئەستەمبوڵ وئەورووپا تەواو کردبوو، لە ساڵی (١٩٠٨) وەك نوێنەری بەغدا لە پەرلەمانی عوسمانی هەڵبژێردراوە، لە ١٩٢١ بەشداری لە کۆنگرەی قاهیرە کردووە، یەکێك بوو لەو سێ ئەندامەی، کە ووردبینی یاسای بنەڕەتی عێراقیان کرد لە ١٩٢٢، لە ساڵی١٩٢١-١٩٢٤ وەزیری دارایی عێراق بووە، لەنێوان ساڵانی ١٩٢٥- ١٩٣٢ وەك ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق بوو.بڕوانە، اديث وائي، ايف، بينروز: العراق (دراسة في علاقاته الخارجية وتطوراته الداخلية ١٩١٥-١٩٧٥)، ت/عبدالمجيد حسيب القيسي، الدار العربية للموسوعات، بيروت، ١٩٨٩، ص١٥٣.

(٤) بۆ درێژەی ئەم نووسراوە بڕوانە، قاسم احمد العباس:وثائق النفط في العراق، ج١، شركة النفط الوطنية العراقية، بغداد، ١٩٧٥، ص ص ١٧٧-١٨٠.

(٥) سليم طه التكريتي: معركة النفط في العراق، مطبعة الزهراء، بغداد، ١٩٥٢، ص ص ٧٤-٧٥.

(٦) بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ناوەڕۆکی ئەم نووسراوە، بڕوانە، عبدالحميد العلوجي وخضير عباس اللامي: المصدر السابق، ج٢، ص ص١١٣-١١٤، محسن الموسوي: النفط العراقي (دراسة وثائقية من منح الامتياز حتى التأميم)، مطبعة الجمهورية، بغداد، ١٩٧٣، ٣٥.

(٧) بۆ ناوەڕۆك، بڕوانە، عبدالحميد العلوجي وخضير عباس

اللامي: المصدر السابق، ج٢، ص ص١١٥-١١٦.

٨) ئەدوارد هەربت کیلینگ (Keeling): ئەفسەرێك بوو لە سوپای بەریتانیا لەگەڵ لەشکرکێشی بەریتانیا بۆ سەر خوارووی عێراق هاتبوو، لە جەنگی کوت بەدیل گیرا لەلایەن تورکەکان، هەروەها لە دواییدا بوو بە ئەندام لە پەرلەمانی بەریتانی، بڕوانە نوري عبدالحميد خليل: التأريخ السياسي لامتيازات النفط في العراق (١٩٢٥-١٩٥٢)، مطبعة الرابطة، بيروت، ١٩٨٠، ص٧٢.

٩) قاسم احمد العباس: المصدر السابق، ج١، ص ص١٨٣-١٨٤.

١٠) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص ص٧٠-٧٢.

١١) بڕوانە، عبدالحميد العلوجي وخضير عباس اللامي: المصدر السابق، ج٢، ص ١٥١.

١٢) حكمت سامي سليمان: نفط العراق (دراسة إقتصادية سياسية)، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٧٩، ص١٢٤.

١٣) بڕوانە، عبدالحميد العلوجي وخضير عباس اللامي: المصدر السابق، ج٢، ص ١٥٩.

١٤) عبدالوهاب السلوم: قضية البترول العراقي، القاهرة، ١٩٦٧، ص ٣٤، نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص ٧٢-٧٣.

١٥) بڕوانە، عبدالحميد العلوجي وخضير عباس اللامي: المصدر السابق، ج٢، ص ص١٦١-١٧٩.

١٦) تاکو ساڵی١٩٧١ یەك پاوەندی ئەسترلیینی (Pound Sterling)شانشینی بەریتانیا پێکهاتبوو لە (٢٠شلن) وهەر شلنێك (١٢) پینس (Pence)ی دەکرد، بەڵام لەدوای ئەم بەروارەوە یەك پاوەند کرا بە (١٠٠) پینس و سیستەمی شلن هەڵوەشایەوە.

(١٧) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص ٧٣.

(١٨) المصدر نفسه، ص٧٥.

(١٩) Willam Stivers: International Politics (١٩١٨ ١٩٢٨). A study in Anglo--and Iraq Oil. American Diplomacy. Harvard College. The Business History Review. Vol. ٥٥. No. ٤ (Winter. ١٩٨١).. p.٥٢٢.

(٢٠) بۆ ناوەرۆکی نووسراوی هێنری دۆبس بڕوانە، عبدالحميد العلوجي واللامي: المصدرالسابق، ج٢، ص ص٢٠٥-٢٠٧

(٢١) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص٧٥.

(٢٢) عبدالرزاق احمد النصيري: نوري السعيد ودوره في السياسة العراقية حتى عام ١٩٣٢، رسالة ماجستير مقدمة إلى جامعة بغداد، ١٩٨٥، ص٢٢٢.

(٢٣) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص٧٥.

(٢٤) عبدالحميد العلوجي واللامي: المصدرالسابق، ج٢، ص ص٢٥٨-٢٥٩.

(٢٥) بڕگەی (٣٦): پەیوەندی بەدەستهەڵگرتنی ئیمتیاز هەبوو لەلایەن کۆمپانیا، یاخود بەخشینی ئەم ئیمتیازە بە کۆمپانیایەکی تر و لە ناوەرۆکیدا هاتووە: "کۆمپانیا ماف هەیە دەستهەڵگرێت لەم ئیمتیازە یان پێی ببەخشێت بە کۆمپانیایەکی تر، بەڵام دەبێت پێش ٣ مانگ بەرلەوەی دەستهەڵگرێت حکومەت ئاگادار بکات بۆ گواستنەوەی خاوەندارییەتی ئەو کەرەستانەی لە بواری کارکردندان بێ ئەوەی هیچ باجێك یان گومرکێك بدات، هەروەها نابێت حکومەت ڕێگریی بکات، بە هەر هۆکارێك بێت"، بەڵام وەزیری دارایی پێشنیازی هەبوو بەوەی ئەم بڕگەیە پێداچوونەوەی بۆ بکرێت و حکومەت ماف هەبێت لە پرسیارکردنی کۆمپانیا لە دەستهەڵگرتنی لە ئیمتیاز ئەگەر هۆکارەکان گونجاو نەبوون ئەوا حکومەت ماف دەبێت بە هەڵوەشانەوەی مەرجەکانی ئیمتیازی کۆمپانیا.

بڕگەی (٣٧): پەیوەندی بە (هێزی شکێنەر، باڵا) هەبوو، کە ئاماژە بەوەی دەکات هەر کەمتەرخەمی یان گوێپێنەدان بە کارەکانی کۆمپانیا بەپێی ئەم ڕێککەوتنە، مانای لادان نییە لە سنووری ڕێککەوتن ئەگەر بەهۆی ئەم فاکتەرانەوە بێت (هێزی خواوەندی، کارەکانی حکومەت، ڕێگرتن لەلایەن میرەکان، حکومەت، میللەت یان هەردەسەڵات دارێك، شۆڕشەکان، چەتەکانی دەریایی، جەنگەکان، مانگرتنی کرێکاران، بڵاوبوونەوەی نەخۆشی، پەتاو ولافاو، وەستانی هێڵی شەمەندەفەر یان هەر ڕێگایەکی گواستنەوە و تۆڕەکانی بۆری، کارەساتی ئاگری بەهێز، بوومەلەرزە، هەموو مەترسیەکانی دەریایی ودەریاچەکان...، چەندین فاکتەری تر لە ژێر دەسەڵاتی مرۆڤدا نەبی.

بڕوانە:

قاسم احمد العباس: المصدر السابق، ج١، ص ص ٢٦٩-٢٧٣.

(٢٦) د.ك.و، البلاط الملكي، رقم الملف (١٦٦٥)، من وزارة العدلية الى وزارة المالية في ١٩٢٤/١/٢١، و١٠، ص١٥-١٩.

(٢٧) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص٧٦.

(٢٨) Helmut Mejcher: Imperial Quest for oil Iraq (١٩١٠-١٩٢٨). Ithaca Press. London. ١٩٧٦. p.١٥٤، محسن الموسوي: المصدر السابق، ص٣٧. اديث وَائي، ايف، بينروز: المصدر السابق، ص١٣١.

(٢٩) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص٧٧.

(٣٠) Helmut Mejcher: Imperial Quest for oil.... p.١٥٠.

(٣١) بڕوانە، دور إحتكار النفط الدولي في العراق...، المصدر السابق، ص ٢٠-٢١.

(٣٢) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص ص٧٧-٧٨.

(٣٣) Petroleum affairs. in Records of Iraq -١٩١٤ ١٩٦٦. Vol ٣. ١٩٢٣-١٩٢٤ Archive Editions. UK. ٢٠٠١. p.٤٢٧.

(٣٤) لەسەر ئاستی عێراقدا چەندین کۆمپانیا هەوڵی دەستکەوتنی ئیمتیازی نەوتیان دەدا، هەروەها ئەم بارودۆخەیان قۆستەوە بۆ پێشکەشکردنی داواکاری بۆ لایەنی عێراقی، لەوانە: کاپتن چینی (J.G.Cheney کە نوێنەری کۆمپانیای نەوتی (The Commercial

Petroleum Co.)، کە لقێکی کۆمپانیای فینیکسی بەریتانی بوو، کە کاری نەوت و گواستنەوەی دەکرد، هەروەها دەڵێن بەریتانیا هانی دابوو بۆ ئەوەی حکومەتی عێراقی سەرقاڵ بکات لە مۆرکردنی ئیمتیاز نەوتی کۆمپانیای (TPC)، ئەم کۆمپانیایە لە (١٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٢٣) داواکاری پێشکەش کردبوو بە حکومەتی عێراقی، کە بری ٢٠٪ لە پشکەکانی کۆمپانیا بە خۆرایی پێدەدا، بۆ زانیاری زیاتر بروانە، S.H.Longrigg: Oil in the Middle East. oxfort. Oxford University Press. (London. ١٩٥٥).. p.٦٩.

(٣٥) نوري عبدالحميد خليل:المصدر السابق، ص ٧٩-٨٦، بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ناوەرۆکی برگەی (٩) لە رێککەوتنی لۆزاندا، بروانە:
اندره نوسشي، الصراعات البترولية في الشرق الاوسط، ت/ اسعد محفل، دار الحقيقة، ط١، بيروت، ١٩٧١، ص ص ١٣٢-١٣٣.

(٣٦) سليم طه التكريتي: معركة النفط في العراق...، ص ص ٧٥-٧٦.

(٣٧) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص ص٨١-٨٢.

(٣٨) المصدر نفسه، ص ص٨٦-٨٧.

(٣٩) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص ٨٢.

(٤٠) Willam Stivers: op. cit. p.٥٢٢.

(٤١) عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات، ج١، ط٢، ص٢٤٢، مجيد عزت: ايرادات الحكومة العراقية من النفط، بغداد، ١٩٦٠، ص٤٦.

(٤٢) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص ص٨٤-٨٥.

(٤٣) دوای ئەوەی وەزارەتی عەبدولرەحمان نەقیب تەواو بوو لە بڵاوکردنەوەی پەیمانی عێراقی_بەریتانی لە (١٣)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٢)، ئەنجوومەنی وەزیران کۆبووەوە لە١٧ی هەمان مانگ بۆ تاوتێکردنی هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی تاسیسی و بڕیاریان دا کە لە (٢٤)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٢) هەڵبژاردن بکرێت، بەڵام بەهۆی بارودۆخی سیاسی ناوخۆی عێراق، هەروەها نارەزایی لە پرۆسەی هەڵبژاردن لەلایەن پیاوانی ئایینی ئەم پرۆسەیە وەستا وپەك خرا تاکو ساڵی (١٩٢٤).
لە سەردەمی وەزارەتی عەبدول موحسن سەعدوون هەڵبژاردن ئەنجام درا وئەنجوومەنی تاسیسی یەکەم دانیشتنی کرد، لە (٢٧)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٤) بە ئامادەبوونی ٨٣ ئەندام لە کۆی ١٠٠ ئەندام، لە گرنگترین خاڵەکانی کارنامەی ئەم ئەنجوومەنە، چاوخشانەوەی بە پەیمانی عێراقی-بەریتانی ساڵی ١٩٢٢، هەروەها دانانی دەستوور (یاسای بنەرەتی)بۆ عێراق، لەگەڵ دانانی یاسای هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی نوێنەران، بۆ زانیاری زیاتر بروانە، عبدالرزاق الحسني: تأريخ العراق السياسي الحديث، ج١، ط٧، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٩، ص٢٥٦، احمد رفيق البرقاوي: العلاقات السياسية بين العراق وبريطانيا (١٩٢٢-١٩٣٢)، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨٠، ص ص٧٤-٧٥.

(٤٤) عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات...، ج١، ط٢ص ٢١٢.

(٤٥) عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات...، ج١، ط٢، ص ص ٢٧١-٢٧٥.

(٤٦) عبدالرزاق الحسني: تأريخ العراق السياسي الحديث...، ج١، ص٢٥٨.

(٤٧) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص ص٨٩-٩٠.

(٤٨) المصدر نفسه، ص ص٨٩-٩٠.

(٤٩) Helmut Mejcher: Imperial Quest for oil.... pp.٨٧-٨٨.

(٥٠) عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات...، ج١، ط٢، ، ص ٢٠٦.

(٥١) بروانە، عبدالحميد العلوجي وخضير اللامي: المصدر السابق، ج٢، ص ص ٣٤٣-٣٤٤.

(٥٢) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص ص٩٢-٩٣.

(٥٣) Petroleum affairs. ١٩٢٤/١٠/١٠. in. R.O.I. Vol ٣. ١٩٢٤-١٩٢٣. pp. ٤٣٦-٤٣٥.

(٥٤) Petroleum affairs. ١٩٢٤/١٠/٢١. in ،. R.O.I. Vol ٣. ١٩٢٤-١٩٢٣. pp.٤٢٩-٤٢٨.

(٥٥) Petroleum affairs. ١٩٢٤/١٠/٢١. in. R.O.I. Vol ٣. ١٩٢٤-١٩٢٣. p.٤٣٢.

(٥٦) بروانە: قاسم احمد العباس: المصدر السابق، ج١، ص ص٢٨٣-٢٨٤.

(٥٧) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص ٩٥.

(٥٨) S.H.Longrigg:op.cit. p.٦٩، نوري عبدالحميد خليل:المصدر السابق، ص٩٥-٩٦.

(٥٩) Petroleum affairs. ١٩٢٤/١١/٦. in. R.O.I. Vol ٣. ١٩٢٤-١٩٢٣. p.٤٣٥.

(٦٠) نوري عبدالحميد خليل:المصدر السابق، ص ص٩٦-٩٧.

(٦١) هارفي اوكونور: الازمة العالمية في البترول، ت/عمر المكاوي، دار الكاتب العربي للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٦٧، ص٣٧٦.

(٦٢) نوري عبدالحميد خليل:المصدر السابق، ص ٩٨.

(٦٣) بروانە:
قاسم احمد العباس: المصدر السابق، ج١، ص ص٢٨٥-٣٠٢.

(٦٤) Willam Stivers: op. cit. p.٥٢٢، نوري عبدالحميد خليل:المصدر السابق، ص ص ٩٨-٩٩

(٦٥) بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم نووسراوە، بروانە: مجلة النفط والتنمية، العدد (٩)، بغداد، حزيران١٩٨٠، ص ٢٠٠-٢٠٣.

(٦٦) نوري عبدالحميد خليل:المصدر السابق، ص ٩٩.

(٦٧) George W.Stocking: Middle East oil. London-١٩٧١. pp.٦٠-٦١.

(٦٨) بروانە:
قاسم احمد العباس: المصدر السابق، ج١، ص ص٣١١-٣١٨.
(٦٩) نوري عبدالحميد خليل:المصدر السابق، ص ١٠٠.
(٧٠) المصدر نفسه، ص ص١٠٠-١٠١.
(٧١) ئەم ڕاپۆرتە لەلایەن وەزارەتی گواستنەوە و ئەشغال بە نووسراوی ژمار (٩٣) لە ١٦ شوباتی ١٩٢٥ ئاراستەی ئەنجوومەنی وەزیران کرا، بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ناوەرۆکی ئەم نووسراوە، بروانە:
مجلة النفط والتنمية، العدد (٩)، بغداد، حزيران١٩٨٠، ص ص ٢٠٤-٢٧.
(٧٢) قاسم احمد العباس: المصدر السابق، ج١، ص٣١٧.
(٧٣) نوري عبدالحميد خليل:المصدر السابق، ص ص ١٠٢-١٠٣.
(٧٤) بروانە:
فاروق صالح العمر: الأحزاب السياسية في العراق ١٩٢١-١٩٣٢، بغداد، ١٩٧٨، ص ص٨٥-١٣١.
(٧٥) بۆ کەموکوری لە بووجەی عێراق لەنێوان ساڵانی١٩٢١-١٩٢٧، بروانە:
مجيد عزت: المصدر السابق، ص ص٤٥-٤٧.
(٧٦) بۆ زانیاری زیاتر بروانە:
عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات...، ج١، ط٢، ص٢٠١، زاهية قدورة: شبه الجزيرة العربية كياناتها السياسية، بيروت، د.ت، ص ص٥٦-٦٣، عمر محمد محمد كريم:القضية الكردية في الصراع البريطاني العراقي ١٩١٨-١٩٣٢، سليمانية، ٢٠٠٨، ص ص ٣١٣-٣١٥.
(٧٧) نوري عبدالحميد خليل:المصدر السابق، ص ١٠٨، محسن الموسوي: المصدر السابق، ص ص٣٥-٣٧.
(٧٨) عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات...، ج١، ط٢، ص ٢٠٨.
(٧٩) نوري عبدالحميد خليل:المصدر السابق، ص ١١٠.
(٨٠) المصدر نفسه، ص ١١١.
(٨١) مجموعة باحثين: المفصل في تأريخ العراق المعاصر، بغداد، ٢٠٠٢، ص ص٦٩٦-٦٩٧، وزارة الاعلام: النفط والمعركة، بغداد، ١٩٧٣، ص١٣.
(٨٢) سليم طه التكريتي:معركة النفط في العراق...، ص٧٨، نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص ص ١١٤.
(٨٣) سليم طه التكريتي:معركة النفط في العراق...، ص٧٨، قاسم احمد العباس: المصدر السابق، ج١، ص ٣٣٢.
(٨٤) الحزب الوطني الديمقراطي:قضية النفط العراقي، بغداد، ١٩٥٢، ص١١، نوري عبدالحميد خليل:المصدر السابق، ص١١٦.
(٨٥) حكمت سامي سليمان: المصدر السابق، ص١٢٥.
(٨٦) نوري عبدالحميد خليل:المصدر السابق، ص ١٢٠.
(٨٧) عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات...، ج١، ط٢، ص ص ٢٠٨-٢٠٩، ابراهيم علاوي: البترول العراقي والتحرر الوطني، دار الطليعة، بيروت، ١٩٦٧، ص١٦، طالب محمد وهيم: موقف الحركة الوطنية من تأميم النفط العراقي حتى عام ١٩٥٢، مجلة النفط والتنمية، العدد (٩)، حزيران ١٩٧٨، ص ص ١٤-١٥، اديث وَ ائي، ايف، بينروز: المصدر السابق، ص١٣٣.
(٨٨) كامل السامرائي: القوانين الخاصة بالنفط، بغداد، ١٩٦٩، ص ص ٦-٣٠.
(٨٩) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص ١٢١.
(٩٠) حكمت سامي سليمان: المصدر السابق، ص١٢٧.
(٩١) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص ١٢١.
(٩٢) دکتۆر کەمال مەزهەر ئاماژەدەکات بەوەی ئەم زانیارییەی لە دوو کەسایەتی ڕووناکبیر و مێژوونووسی کورد مستەفا ڕەسول، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی وەرگرتووە، بروانە:
كمال مظهر احمد: كركوك وتوابعها حكم التأريخ والضمير (دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق)، ج١، مطبعة رينوين، حكومة اقليم كردستان، د.ت.، ص١٧٤.
(٩٣) بروانە:
دیوانی شاعیر، عبدالخالق علاءالدین: مەلای گەورە (زاناو ئەدیب وشاعیر)، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ل ١٣١-١٣٥.
(٩٤) وەرگیراوە لە، صورة المقاولة المنعقدة بين الحكومة العراقية و شركة النفط التركية المحدودة في ١٤/اذار/١٩٢٥، طبع في مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٢٦، ص ص ١-١٨.
(٩٥) فاضل حسين: مشكلة الموصل (دراسة في الدبلوماسية العراقية-الانكليزيه-التركية وفي الراي العام)، ط٣، مطبعة اشبيلية، بغداد، ١٩٧٧، ص٣٩.
(٩٦) دوای ئەوەی لە (٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٣) دا دواین سەربازی هاوپەیمانان لەسەر زەوییەکانی تورکیا کشایەوە، هەمان ڕۆژ حکومەتی بەریتانیا دەسەڵاتیدا بە نقل هندرسن، کە کارەکانی بەریتانیا لە تورکیا ڕادەپەڕاند دەست بکات بە گفتوگۆکردنی ڕاستەوخۆ لەگەڵ تورکیا، ئەویش لە ڕێگای خۆیەوە یادداشتێکی دا بە حکومەتی تورکی، کە باس لە مادەی ٣ کۆنگرەی لۆزان دەکات، بەڵام ئەم گفتوگۆیانەی نێوان هندرسن و عەدنان بەگ لەلایەن تورکیا کاتێکی زۆری خایەند، هۆکارەکەش دەگەڕێتەوە بۆ هەردوو لایەن، کە هەوڵی ئەوەیان دەدا باروودۆخی ناوخۆیی ودەرەکی ئەوکاتە بقۆزنەوە بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان، بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەو هۆکارانەی ئەم گفتوگۆیانەی دووروودرێژ کرد لەنێوان تورکیا وبەریتانیا، بروانە:
بيار مصطفى: السياسة البريطانية تجاه توركياواثرها في كوردستان١٩٢٣-١٩٢٦، دار سپيرێز، اربيل، ٢٠٠٤، ص ص ١٦١-١٦٢.
(٩٧) س.جي.ادموندز: كرد وترك وعرب، ت/جرجيس فتح الله، مطبعة التايمس، بغداد، ١٩٧١، ص ٣٤٧، فاروق صالح العمر: المعاهدات العراقية...، ص١٤٥.
(٩٨) میم کەمال ئۆڤە: کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی موسڵ ١٩١٨-١٩٢٦، و/سەلام ناوخۆش، دهۆك، ٢٠٠٠، ل٦.
(٩٩) س.جي.ادموندز:المصدر السابق، ص ٣٤٨، فاضل حسين: المصدر السابق، ص٤٠.
(١٠٠) ئاشوورییەکان پێش جەنگی یەکەمی جیهانی نیمچە

خوودمختارییەکیان هەبوو لەناوچەکانی هەکاری کە لەژێر دەسەڵاتی عوسمانی دابوو، بۆیە بەریتانییەکان لەهەوڵی ئەوەدا بوون ئەم مافە بۆ ئاشوورییەکان بگەڕێننەوە، لە نیسانی ساڵی (١٩٢٤) بە حکومەتی عێراقیان ڕاگەیاندبوو کە هەوڵی لکاندنی بەشێك لە زەوییەکانی ئاشوورییەکان دەدەن بۆ ناو سنووری عێراق بەو مەرجەی حکومەتی عێراق هەمان مافی خوودمختاریان بداتێ، دوای سەرنەکەوتنی کۆنگرەی ئەستانە بەریتانییەکان بۆ ئەم مەبەستەیان پشتیوانی لە ئاشوورییەکان دەکەن لە ڕاپەڕینی چەکدارییان لە (٧)ی ئابی ساڵی (١٩٢٤). کە لە ئەنجامیدا ناوچەی هەکاری دەگرن، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:-

قسطنطين بتروفيج ماتڤييڤ بارمتي: الآشوريون والمسألة الآشورية في العصر الحديث، ت/ح.د.ا، موسكو، ١٩٧٩.، البرت ميخايلوفج منتشاشفيلي: كفاح الآشوريين من اجل الحكم الذاتي ١٩٢٠-١٩٣٣، ت/محمد البندر، دهوك، ٢٠٠٨.

(١٠١) میم کەمال ئۆڤە: کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی موسڵ، ل٦.

(١٠٢) فاضل حسين: المصدر السابق، ص٤١.

(١٠٣) المصدر نفسه، ص٤٢.

(١٠٤) كمال مظهر احمد: كركوك وتوابعها...، ص١٩٣.

(١٠٥) ستيڤن همسلي لونگريك: تأريخ العراق الحديث ١٩٠٠-١٩٥٠، ت/سليم طه التكريتي، بغداد، ج١، ١٩٨١، ص١٤٦.

(١٠٦) س.جي.ادموندز: المصدر السابق، ص ٣٤٨.

(١٠٧) عمر محمد محمد كريم: القضية الكردية في الصراع البريطاني العراقي ١٩١٨-١٩٣٢، مديرية الطبع والنشر السليمانية، سليمانية، ٢٠٠٨، ص ص ٢٨٣-٢٨٤.

(١٠٨) فاضل حسين: المصدر السابق، ص ص٥٤-٦٢، ولاية الموصل، تقرير لجنة عصبة الأمم الخاصة بحل النزاع التركي -البريطاني حول ولاية الموصل، مراجعة وتحقيق/ عبدالرزاق مةحموود القيسي، سليمانية، ٢٠٠٩، ص١٩.

(١٠٩) كمال مظهر احمد: كركوك وتوابعها...، ص١٩٣.

(١١٠) ولاية الموصل، تقرير لجنة عصبة الأمم الخاصة...، ص ص١٩-٢٠.

(١١١) عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات...، ج١، ط٢، ص١٩٦، حوسێن مەدەنی: کوردستان وستراتیژی دەوڵەتان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٣٩٦. ئەوەی شایەنی باسکردن بێت نازم بەگ وفەتاح بەگ وەك دوو پسپۆر لەگەڵ شاندی تورکی بوون بۆ یاریدەری لیژنە، جێگای ناکۆکی ونارەزایی بوون لەلای حکومەتی عێراقی و مەندووبی سامی بەریتانیا، تەنانەت بۆ ماوەی ١٥ ڕۆژ لیژنە کارەکانی وەستا بەهۆی ناکۆکی لەسەر ئەم دوو کەسایەتییەوە، حکومەتی عێراق و هێنری دۆبس ئەم دوو کەسایەتییە بە ڕاکردوو لە یاسا دانابوو، تۆمەتی ئەوەیان خستە پاڵیان، کە ئاژاوە بۆ لیژنە دروستدەکەن ئەگەر بوونی ئەمان لەم لیژنەیەدا بێت، لیژنە سەرسووڕمانی خۆی دەربری لەسەر هەڵبژاردنی تورکیا بۆ دوو کەسایەتی تۆمەتبار ڕوانگەی حکومەتی عێراقییەوە، ئەم دوو کەسایەتییە دانیشتووانی ویلایەتی موسڵ بوون، بۆیە جێگای گومان بوون، چونکە نابێت لیژنە کەسایەتی تێدابێت لەدانیشتووانی هەمان جێگای ناکۆکی، پێش ئەوەی چارەسەرێکی کۆتایی بۆ ئەم ویلایەتە دۆزرابێتەوە، بڕوانە، ولاية الموصل، تقرير لجنة عصبة الأمم الخاصة...، ص ص ٢٣-٢٥.

بەڵام لە ڕاستیدا مەترسی بوونی ئەم دوو کەسایەتییە لەلایەن بەریتانیا و حکومەتی بەریتانیا بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە تاوانبار یاخود ڕاکردوو بوون لە یاسا، بەڵکو کەسایەتی فەتاح بەگ وەك زاوای شێخ مەحموود کە سەرکردایەتی بزووتنەوەی خواستەکانی کوردی دەکرد لە ولایەتی موسڵ بۆ دامەزراندنی قەوارەیەکی تایبەت بەکورد، کەسایەتی نازم بەگ، کە پیاوێکی دیاری بنەماڵەی نەفتچی زادە بوو، کە سوڵتانی عوسمانی ئیمتیازی نەوتی کەرکوکی پێیان بەخشیبوو لە ساڵی ١٨٧٢، کە ئەم دوو تەوەرە خاك و نەوتی ویلایەتی موسڵ لەم دووکەسایەتییە کۆدەبوونەوە مەترسی دروستکردبوو لەلای داگیرکەران، بڕوانە، هنري فوستر: نشأة العراق الحديث، ت/سليم طه التكريتي، ج١، ط١، الفجر للنشر والتوزيع، بغداد، ١٩٨٩، ص٢٥٥، كمال مظهر احمد: كركوك وتوابعها...، ص١٧٣.

(١١٢) ولاية الموصل، تقرير لجنة عصبة الأمم الخاصة...، ص ص٢١-٢٢.

(١١٣) عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات...، ج١، ط٢، ص١٩٧.

(١١٤) سروه اسعد صابر: كوردستان من بداية الحرب العالمية الأولى إلى نهاية مشكلة الموصل١٩١٤-١٩٢٦، اربيل، ٢٠٠١، ص٣٠٠.

(١١٥) ولاية الموصل، تقرير لجنة عصبة الأمم الخاصة...، ص ص٢١-٢٢، عمر محمد محمد كريم: المصدر السابق، ص ص ٢٩٨-٢٩٩.

(١١٦) بڕوانە، س.جي.ادموندز: المصدر السابق، ص ص٣٧٣-٣٧٤.

(١١٧) المصدر نفسة، ص ٣٦١.

(١١٨) ئاكۆ عبدالكريم شوانی: شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢، سلێمانی، ٢٠٠٢، ص٢١٠.

(١١٩) عمر محمد محمد كريم: المصدر السابق، ص ٣٠٠.

(١٢٠) كمال مظهر احمد: كركوك وتوابعها...، ص١٩٤.

(١٢١) نوری طالبانی: ( ویلایەتی موسڵ لەلایەن ئینگلیز لکێندرا بە دەوڵەتی عێراقەوە لەبەر بەرژەوەندی خۆی ولەبەر نەوتی کەرکوك، نەك لەسەر هەڵویستی کورد)، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (١٨)، پایزی٢٠٠٣، ل١٣.

(١٢٢) ئاكۆ عبدالكريم شوانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٥.

(١٢٣) فاضل حسين: المصدر السابق، ص٣٠٢.

(١٢٤) Helmut Mejcher: Imperial Quest for oil..., p.١٥٠.

(١٢٥) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص ص١١٢-١١٣.

(١٢٦) فاضل حسين: المصدر السابق، ص ٢٣٩.

(١٢٧) عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات...، ج١، ط٢، ص٢٠٧.

١٢٨) رادوڤان پاڤیچ: جولانەوەی رزگاریخوازانەی کورد لە خەباتیدا بۆ سەربەخۆیی نەتەوایەتی وسیاسی، و/مەحمود مەلا عززەت، سوید، ١٩٨٥، ل٤١.

١٢٩) جرجيس فتح الله: النفط قرر مصير كوردستان السياسي، مجلة الثقافة الكردية، العدد (٢) اذار١٩٩٠.لندن، ص٢٢.

١٣٠) سليم طه التكريتي: معركة النفط في العراق...، ص ٧٧.

(١٣١) Helmut Mejcher: Imperial Quest for oil.... p.١٤٠.

١٣٢) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص١١٤.

(١٣٣) Helmut Mejcher:Imperial Quest for oil.... pp.١٤٠-١٥٣، نوري عبدالحميد خليل:المصدر السابق، ص.١١٧

(١٣٤) Benjamin Shwadran: The Middle East Oil and the Great Powers, (Frederick A. Pracger -New York), ١٩٥٥., p.٢٣٧.

١٣٥) نوري عبدالحميد خليل: المصدر السابق، ص ص١١٨-١١٩.

١٣٦) ولاية الموصل، تقرير لجنة عصبة الأمم الخاصة...، ص ٣٧.

١٣٧) بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی هەموو بەڵگەنامەکانی ئابووری و جوگراڤی و سیاسی و ئەتنی و ژمارەی دانیشتووان بروانە، المصدر نفسه، ص ص ٢٢٢-٢٣١، جرجيس فتح الله:يقظة الكرد...، ص ص٦٦١-٦٧٧.

١٣٨) بروانە، س.جي.ادموندز:المصدر السابق، ص ٣٨٣، سروه اسعد صابر: المصدر السابق، ص٣١٠، حامد محمود عيسى: القضية الكردية في العراق...، ص ٩٣، ولاية الموصل، تقرير لجنة عصبة الأمم الخاصة...، ص ص٢٢٧-٢٢٨.

١٣٩) ولاية الموصل، تقرير لجنة عصبة الأمم الخاصة...، ص ص٢٢٨-٢٣١، جرجيس فتح الله:يقظة الكرد...، ص ص٦٧١- ٦٧٤، تشارلز تريب: صفحات من تأريخ العراق (بحث موثق في التأريخ المعاصر منذ نشوء الدولة الحديثة حتى اواسط ٢٠٠٢)، ت/زينة جبار ادريس، بيروت، ٢٠٠٦، ص١٠٠.

(١٤٠) لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٤) بە بڕیارێکی ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان هێڵێکی وەهمی دانرا، بە ناوی (هێڵی برۆکسێل) وەك سنوورێکی کاتی لەنێوان تورکیا وبلایەتی موسڵ دانرا بۆ کۆتایی هێنان بەو پێکدادانە سەربازییانەی هەبوون لەلایەن هێزەکانی بەریتانیا وحکومەتی تورکیا، چونکە هەردوو لایەن تەماحیان هەبوو لە کۆنترۆڵکردنی گەورەترین رووپێو لە ناوچەکانی جیناکۆك بۆ خۆسەپاندنی واقعی بەسەر ئەو زەوییانەدا، دوای ئەوەی شکستیان هێنا بە دبلۆماسیەت رێکەون، بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی جولانەوەی هێزەکانی تورکیا وبەریتانیا، بروانە، بیار مصطفى:المصدر السابق، ص ص ١٧٠-١٧٣.

(١٤١) باسيلي نيكيتين:الكرد، دراسة سوسيولوجية وتاريخية، ت/نوري طالباني، ط٣، مؤسسة حمدي للطباعة والنشر، سليمانية، ٢٠٠٧، ص ٣٢٩، نوری طالباني: سەرچاوەی پێشوو، ل ل١١-١٢.

(١٤٢) بروانە، س.جي.ادموندز:المصدر السابق، ص٣٨٣، ستيفن همسلي لونكريك: المصدر السابق، ج١، ص ٢٥٤.

(١٤٣) بروانە، عبدالرزاق الحسني: تأريخ العراق السياسي الحديث...، ج٣، ص ص١٣٠-١٣١، ستيفن همسلي لونكريك: المصدر السابق، ج١، ص ٢٥٤، فاضل حسين: المصدر السابق، ص ص ١٧٣-١٧٤، Habibollah Atarodi: Great Powers, Oil&The Kurds in Mosul (Southern Kurdistan / Northern Iraq ١٩١٠-١٩٢٥), University Press of America, New York, ٢٠٠٣, p٢٠٢

(١٤٤) بۆ دەربارەی ئەم پەیمانە بروانە، فاروق صالح العمر: المعاهدات العراقية...، ص١٥٠-١٥٨.

(١٤٥) نوری طالباني: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢.

(١٤٦) جان بول شانيولو، سيدي احمد سياح: مسألة الحدود في الشرق الاوسط، ت/حسين حيدر، بيروت، ٢٠٠٩، ص١٦٠.

(١٤٧) هەروەها ماڤی تورکیا درا بەوەی ئەم رێژەیە بگۆڕێتەوە بە بڕێکی پارە کە (٥٠٠) هەزار پاوەندی ئەسترلینی دانابوو، بروانە: Benjamin Shwadran:op.cit, p.٢٣٣.

(١٤٨) بۆ دەقی ئەم بەڵگەی رێککەوتنی سێ قۆڵی نێوان بەریتانیا وتورکیا وعێراق بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان بروانە، کامەران ئەحمەد محەمەد: کوردستان لەنێوان ململانێی نێودەوڵەتیی وناوچەییدا (١٨٩٠-١٩٣٢)، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ل٣٢٨-٣٣٣.

(١٤٩) Benjamin Shwadran: op. cit, p.٢٣٨.

(١٥٠) فيروز حسن عزيز: الاهمية الجيوستراتيجية لكردستان الجنوبية واثرها على السياسة البريطانية تجاهها (١٩١٤-١٩٢٤)، السليمانية، ٢٠٠٨، ص ص٣٣١-٣٣٢.

(١٥١) بروانە، کامەران ئەحمەد محەمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣٣.

(١٥٢) Benjamin Shwadran: op. cit, p.٢٣٨، جان بول شانيولو، سيدي احمد سياح:المصدر السابق، ص.١٦٠

(١٥٣) فاضل حسين: المصدر السابق، ص٣٠٢، عمر نجم سورجي: مصير ولاية الموصل (كوردستان الجنوبية) مابعد عام٢٠٠٠، السليمانية، ١٩٩٨، ص٧٣، نوری طالباني: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢، فيروز حسن عزيز: المصدر السابق، ص ص ١٧٦-١٧٩، سمکۆ بەهرۆز محەمەد (ئەژی): گۆڕانە ئابوورییەکانی کەرکوك لە روانگەی سەردەمە مێژووییەکانەوە، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ٨٣، Habibollah Atarodi: op. cit, p٢٠٥.

*** کوردو تورکمان، رابردوویەکی پڕ لە قەیران و داهاتوویەکی تەماویو نادیار:**

**موعتەسەم نەجمەدین**

ئەوەی مایەی نیگەرانییە، پەیوەندیی نێوان کوردو تورکمان مێژوویەکی دوورو درێژو زەوییەکی خوێناوی بە یەکیانەوە دەبەستێت. ئەم دوو نەتەوەیە لە راستیدا تا ئەمڕۆ بەرژەوەندییەکی هاوبەشیان بۆ دروست نەبووە، بەڵکو هەر یەکەیان لە ئاوازێك دەخوێنێتو ئەوی تر نیگەران دەکات.

لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانیدا سیاسەتی تەتریكو راگواستنی کورد، یەکەم بەردی بناغەی ستراتیژیی دژایەتیو ناکۆکیی نێوان نەتەوەکانی کەرکوکی دروست کرد. لەو سەردەمەدا دەیان خێزانی کورد بوون بەتورکمان. ئەمڕۆش هەندێك لەوانە چوونەتە پاڵ تورکمانە توندڕەوەکانو دەستی باڵایان لە کێشەو گرفتەکاندا هەیە.

بەرووخانی دەسەڵاتی عوسمانیو بەدرێژایی ماوەی دەسەڵاتی پاشایەتی، تورکمانەکان لە عێراقدا نەیانتوانی هیچ حیزبێك، یان رێکخراوێکی سیاسی، دابمەزرێنن. هیچ سەنگێكو چالاکییەکی سیاسییان نەبوو. بەدارمانی دەسەڵاتی پادشایەتی لە سەردەمی قاسمدا لە ژێر چەتری لاوازی دەسەڵاتو ناجێگیری سیاسیدا، بەپاڵپشتی تورکیاو بەهاوکاریی شۆڤێنیزمی عەرەبی، پایەی سیاسیی خۆیان لە سەر دژایەتیی کوردو دەسەڵاتی قاسم بنیات نا. بەدارمانی دەسەڵاتی قاسمو هاتنە سەرکاری حوکمی بەعس، تورکمانە توندڕەوەکانو ئاژاوەچییەکان جارێکی تر پەرو پارچەو بوخچەی خۆیانیان پێچایەوە. تا سەرەتای ئەوەتەکان، بەدەرکردنی بەعس لە کوردستان لە سێبەری لایەنە سیاسییە کوردییەکاندا، تورکمانەکان لە کوردستاندا کەوتنەوە دامەزراندنی پارتو رێکخراوی سیاسی. بەدارمانی بەعسو لاوازبوونی دەسەڵاتی سیاسیی ناوەندو دامەزراندنی دەسەڵاتێکی نوێی نیمچە دیموکراسیو مەدەنی لە عێراقدا، تورکمانە شۆڤێنیستەکان جارێکی تر بۆ دژایەتیکردنی کورد هاتنەوە مەیدان. هەر لە سەرەتاوە دەستیان لەگەڵ شۆڤێنیزمی عەرەبیو بەرەی تیرۆر تێکەڵکرد.

ئەم راستییانە ئەوە دەسەلمێنن، کە تورکمانە شۆڤێنیستەکان بەبەردەوامی لە بەرەی دژ بە گەلو نیشتمانو دەسەڵاتی دیموکراسیو مەدەنیدا بوون، هاوشان لەگەڵ دەسەڵاتە شۆڤێنییەکانی عەرەبدا، تورکمانەکان لە دژی بەرژەوەندیی گشتیدا کاریان کردووە.

بە چڕکردنەوەی باسەکە، تورکمان لە کەرکوکدا لە دوو سەردەمدا توانیویەتی رۆڵی سیاسی هەبێت. سەردەمی عەبدولکەریم قاسمو سەردەمی عێراقی نوێدا، واتە سەردەمی دوای دەسەڵاتی بەعس، ئەم دوو سەردەمە، جگە لەوەی لێکچوونێکی زۆریان هەیە، هاو کات رووداوو بەسەرهاتەکانیشیان زۆر لە یەك دەچن.

من لێرەدا بەمەبەستی بەرچاوڕوونی، هەندێك لەو راستییانە دەخەمەڕوو. بۆ ئەم مەبەستەش هەڵسەنگاندنو شیتالییەکی سەرپێییانە بۆ هەردوو رێپێوانەکەی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٩)و (٢٨)ی تەمووزی ساڵی (٢٠٠٨) دەکەم.

*** سەرەتای دەستپێکردنی رێپێوانەکان:**

لە (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٩)دا، بۆ ساڵیادی کودەتاکەی قاسمو دامەزراندنی دەسەڵاتی کۆماری لە عێراقدا، کوردو شیوعییەکان لە کەرکوك، لە لایەك بۆ پاڵپشتی دەسەڵاتو سەپاندنی ئاشتی، کە ئەو کات زیاتر دروشمی دەسەڵاتی نوێی کوردو شیوعییەکان بوو، بڕیاریاندا رێپێوانێکی ئاشتی بکەن. ئەو کات، وەك ئەمڕۆ، تورکمانە شۆڤێنیستەکان بە رۆڵی کوردو شیوعی قەڵس دەبوون. بۆیە زۆر هەوڵیان دەداو هەرەشەیان دەکرد ئەو رێپێوانە نەکرێت. بەڵام شیوعییەکان ئەو کات بەمەبەستێكو قاسمو دارو دەستەکەی بەمەبەستی نانەوەی ئاژاوەو لێدانی شیوعییەکان، لە لایەکی تر سوور بوون لە سەر ئەنجامدانی رێپێوانەکە.

ئاپۆرەی خەڵك ئەو کات لە قەڵاوە بە پردی نزیك گەراجی حەویجەدا رووی لە بازاڕی ئەوبەری پردەکە کرد بەرەو ئەحمەد ئاغا بە شەقامی (ئەتڵەس)دا، کە چەند جێگایەکی کۆبوونەوەی تورکمانە توندڕەوەکانی لەخۆ دەگرت، لەوانە گازینۆکەی عوسمان، کە خاوەنەکەی پیاوێکی توندڕەوی تۆرانی بوو.

لەوێدا تورکمانە تۆرانییەکان کەوتنە نەخشەو پلاندانان بۆ تێکدانی رێپێوانەکە، ئەو کات لە سەر گازینۆکەوە تەقە بە چڕیو هەرەمەکی کرایە ناو ئاپۆرەی خەڵکەکەوەو ئاژاوەکە دروستبوو، دەیان کەس بریندارو شەهید کرا.

لە (٢٨)ی تەمووزی ساڵی (٢٠٠٨)دا، کاتێك کوردەکان بۆ پاڵپشتی یاساو پێشێلنەکردنی دەستوورو سەپاندنی مافە رەواکانیان بە رێگای ئاشتیو مەدەنییانە رێپێوانێکیان دەستپێکرد، لەم کاتەدا بە هەمان شێوەی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٩) تورکمانە توندڕەوەکانو پاشماوەکانی بەعس کەوتنە هەرەشەو گورەشەو نانەوەی ئاژاوەو پشێوی بۆ تێکدانی رێپێوانەکە، کە ئاپۆرەی خەڵکی سپی ئاشتیخواز گەیشتنە نزیك پارێزگای کەرکوك پلانەکەی شۆڤێنیستەکان بە هاوکاری رێکخراوی تیرۆریستی قاعیدە بە کردەوەیەکی خۆکوژی دەستپێکرد. لەو کردەوەیەدا زیاتر لە بیستو پێنج هاوڵاتی بێ چەكو بێ دیفاعیان شەهیدکرد، لەگەڵ ئەمەشدا توندڕەوەکانی تورکمان لە سەر بارەگاکانی خۆیانو لەلایەن هەندێك لە پۆلیسی تورکمانو عەرەبەوە تەقەکردن لە خەڵك دەستپێکردو چەندین کەسیان شەهید کردو چەندین کەسیشیان بریندار کرد. لەمەش زیاتر هەندێك لە شۆڤێنیستەکان وا باس لەم کردەوە تیرۆرستییە دەکەن، کە تۆڵەکردنەوەیە لە رووداوەکەی ساڵی (١٩٥٩).

تەوەری ئەم دوو رووداوە تەواو دووبارەبوونەوەی مێژووە. لێرەدا رەنگە بوار نەبێت بە چڕی قسە لە سەر ئاکارو هۆکارەکانی ئەم دوو رووداوە بکرێت. بۆیە من تەنها

ڕووداوەکان بە سادەیی‌و بە ڕووتی دەخەمە بەر چاوی خوێنەر، بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا خوێنەر خۆی دادوەر بێت‌و بڕیار بدات.

لە ساڵی (١٩٥٩)دا بەرپەرچدانەوەی شیوعییەکان بۆ تەقەو کوشت‌و بڕی تورکمانە تۆرانییەکان‌و تۆڵەکردنەوە لێیان، ئازاردان‌و کوشتنی بیست‌و حەوت تورکمانی لێکەوتەوە. لە تۆڵەی ئەمەدا قاسم بە هەڵی زانی دەستی خۆی لە شیوعییەکان‌و کورد بوەشێنێت. بەم ئاکامە، جگە لەوەی باڵانسی شیوعییەکان زۆر بەرەو داکشان چوو، هاوکات بوو بە هۆکار بۆ لێدانی کوردو کێشەکەی. ئەو کات قاسم ڕاستەوخۆ بڕیاریدا بە ناردنی سوپاو ئەفسەرە شۆڤێنییەکان بۆ کەرکوك. بە گەیشتنی ئەم سوپایە، لەگەڵ دەستپێکردنی ڕەشەکوژیی خەڵکی بێ دیفاعی کورد، چەندین کەسایەتیی چالاکی شیوعییەکان دەستگیرکران. دواتریش سزای لەسێدارەدانیان بە سەردا سەپێندرا. ئەو ڕووداوە بۆ کورد ڕۆژێکی ڕەشی لێکەوتەوە. بۆیە، لێشاوی دەرکردن‌و ڕاگواستن‌و هەڵهاتنی کورد لە کەرکوکدا گەیشتە ترۆپك، تاکو تەرا لە گەرەکە کوردنشینەکاندا خەڵك‌و ماڵی کوردت دەبینی، جلو بەرگی کوردی‌و ناسنامەی کوردایەتی وەك تلیاکیان لێ هات‌و قاچاغ بوون.

لە چەند ڕۆژێ پێش (٢٨)ی تەمووزی ساڵی (٢٠٠٨) بەرەی تورکمانی‌و هاوسۆزانی کەوتنە خۆئامادەکردن بۆ ڕێگرتن لە ئەنجامدانی ڕێپێوانەکەو بە هەڕەشەو پیلان‌و بە نییەت خراپی پێشوازییان لە ڕێپێوانەکە کرد. لە دوای ڕووداوەکەش تورکمانە توندڕەوەکان‌و عەرەبە شۆڤێنیستەکان، سەرەڕای کوشت‌و بڕی کورد، بەردەوامبوون لە سەر پەیڕەوکردنی سیاسەتی نیگەرانکردن‌و ئاژاوەنانەوە. تا جارێکی تر کورد بەو هەڵەیەدا بەرن، کە چەند تورکمانێك بکوژێت‌و ئەشکەنجە بدات، بۆ ئەوەی هەمان مێژووی ڕەش وەك خۆی جارێکی تر دووبارە ببێتەوە. شۆڤێنیستەکان ئەمجارەش وەك (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٩) دەیانویست سوپای شۆڤێنیستی عەرەبی بنێرنە کەرکوك‌و داگیری بکەن‌و بکەونە لێدان‌و ئازاردانی دانیشتووانە کوردەکەی.

ئەوەی جێگای دڵخۆشییە، کورد ئەم جارە نەکەوتە بۆسەی پیلانەکانی ئەوانەوە، توانی خۆڕاگر بێت، پەنا بۆ یاساو دادگا بەرێت. بەم کردەوەیەش شۆڤێنی‌و شۆڤێنیستەکان زۆر سەغڵەت بوون‌و کەوتنە بەرپاکردنی پڕوپاگەندەو پلان‌و بانگەشەی هاتنی سوپای عەرەبی شۆڤێنی‌و سوپای تورکیا بە بیانووی ئەوەی کورد بە نیازە تۆڵەی خۆی لە تورکمان بکاتەوە، بەڵام ئەوەی باری بەرەی تورکمانی‌و شۆڤێنییەکانی شلۆق کرد، ئەوە بوو دەزگا ئەمنییەکانی شاری کەرکوك توانییان ناسنامەی خۆکوژە تیرۆرستەکە، کە کەسێکی تورکمان بوو، بدۆزنەوە، بڕێك لەو ئەفسەرانە دەستگیر بکەن، کە لەو ڕۆژەدا تەقەیان لە خەڵك کردبوو. ئەمانەش لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە ئەوەیان ئاشکراکرد، کە ئەمان بە فەرمانی هەندێك لە سەرانی بەرەی تورکمانی تەقەیان لە خەڵك کردووە.

لەم دوو ڕووداوەدا هەموو ئاکارو هۆکارو عەقڵەکان یەکبوون. تەنها کورد نەبێت توانی ئاکامەکەی بە دروستی بگۆڕێت، نەهێڵێت خەونە سوواوەکانی ناحەزانی دیموکراسی‌و پێکەوە ژیان بێتە دی. بۆیە من پێموایە ئێمە لەگەڵ زیانی گیانی‌و ئەو زوڵمەی کرایە سەرمان زیانمان نەکردووە. قوربانییەکانی ئەو ڕووداوە شەهیدی ڕاستەقینەی نەتەوایەتی‌و نیشتیمانین، بۆیە شەهیدەکانمان دەبێت وەك شەهیدانی سەنگەری خەبات‌و ڕزگاری مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، ڕێزیان لێبگیرێت‌و قەرەبوویان بۆ بکرێتەوە، چونکە ئەوانە دەبنە پێشمەرگەی سەنگەری سەردەمێکی نوێ.

لەم ڕووداوەدا تورکمان بە تەقەو ڕاگەیاندنی چەواشەو شەڕانگێزی‌و عەرەبیش بە تەقینەوە ویستیان کارەسات‌و قەسابخانەکەی ساڵی (١٩٥٩) دووبارە بکەنەوە، لە ڕووداوی (٢٨)ی تەمووزی ساڵی (٢٠٠٨) ئەگەر ئاراستەی خەڵك ڕووەو ناوچە تورکمانییەکان بچووبایەو سەد تورکمانێك بکوژرایە. ئایا ئێستا ئاکامەکە چی دەبوو؟ ئایا ئێستا ئەو بیانووە بە دەستەوە نەبوو، کە سوپای عەرەبی لە بەغدادەوە بێنە کەرکوك؟ هاتنی سوپا چ کارەساتێکی بۆ کورد لێ دەکەوتەوەو بە عەقڵ‌و باوەڕی کێ جارێکی تر ئەو سوپایە کەرکوکی جێدەهێشتەوە؟ ئەمانەو دەیان پرسیاری تر دەبێت کورد بە وردی بیانخاتە نێو مەودای بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەکانییەوەو بە وردی شیتاڵکارییان بۆ بکات.

لە سەردەمی قاسمدا شیوعییەکان‌و تورکمانە شۆڤێنیستەکان چەقۆیان لە یەك دەسوو. ئەمڕۆ لایەنێکی کوردی‌و بەرەی تورکمانی دان لە یەك جیر دەکەنەوە. لە سەردەمی قاسمدا تورکمانە توندڕەوەکان داوایان دەکرد کەرکوك بخرێتە سەر تورکیا، بەڵام ئەمڕۆ داوادەکەن نەخرێتە سەر هەرێمی کوردستان‌و بخرێتە سەر کێ؟ گرنگ نییە. ئەگەرچی ئەو وڵاتە چینیش بێت. لە سەردەمی قاسمدا تورکمانە توندڕەوەکان‌و عەرەبە شۆڤێنیستەکان لە تورکیاو سوریاو میسرەوە پاڵپشتی‌و هێزو ڕێنماییان وەرگرتووە. ئەمڕۆ شۆڤێنیستەکان سەرچاوەکانی هێزو بیرو بۆچوونیان لە ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان‌و تورکیاوە وەردەگرن.

لە ساڵی (١٩٥٩)دا قاسم لە بۆسەدا بوو بۆ لێدانی کوردو شیوعییەکان. تا نووسینەوەی ئەم کتێبەش دەسەڵاتی شۆڤێنیستی عەرەبی لە بۆسەدایە بۆ لێدانی کوردو دەرکردنی لە کەرکوك، لەم دوو ڕووداوەدا لایەنێك بە بەردەوامی سوورە لە سەر ڕێپێوانەکەو یادکردنەوەو لایەنێك سوورە لە سەر تێکدانی ڕێپێوانەکەو کوشتنی ئاشتیخوازان. بۆیە پوختەی مەبەست، من پێموایە ناحەزانی کورد ئەمڕۆ وەك مەگەز لە سەنگەرو بۆسەدان تا کەلێنێك بۆ چوونە ناو لەشی کورد بدۆزنەوەو گەرای شەڕو مەرگی تیادا دابنێن. لەبەر ئەمە، بەهێزترین وەڵامدانەوەو تۆڵەکردنەوە لە شۆڤێنیستەکان لە کەرکوکدا خۆڕاگرتنی کوردە لە بەرانبەر ئەو کردەوە تیرۆرستییانە.

لێرەدا تاڵترین ڕاستی ئەوەیە، لە دوای هەموو ئەم کارەساتەو لە دوای ئەو ڕووداوە خوێناوییەی (٢٨)ی تەمووزی ساڵی (٢٠٠٨)، هێشتا هەردوو گەلی عەرەب‌و تورك ئامادە نین دان بە مافەکانی کورد لەم شارەدا بنێن،

عەرەب وەك ئەوەی کاریگەری پاشماوەی شۆڤێنێتی عەرەبیو بەعسیزمی لە سەرماوە، گەرانەوەی کەرکوك بۆ کوردستان بە ترسێکی گەورە لە سەر ئاسایشی نەتەوەی عەرەبی دەزانێت، هەندێك جاریش ئەم بیرۆکەیەی شۆڤێنیسی عەرەبی ئەمەش رەت دەکاتەوە، بانگەشەی ئەوە دەکەن (بە گەرانەوەی کەرکوك بۆ سەر هەرێمی کوردستان ئیسرائیلێکی تری دژ بەعەرەب دروست دەبێت)، چونکە بە گەراندنەوەی بۆ باوشی دایکی، کەرکوك دەبێتە تۆوی دامەزراندنی دەولەتێکی کوردی. ئەمەش لای عەرەبو تورك تا ئەمرۆ بە هیچ شێوەیەك جێگای رەزامەندی نییەو لە سەرجەم ئاستە سیاسیو کۆمەلایەتییەکانی تورکیو عەرەبیدا رەتدەکرێتەوە، وەك تورکیاش، کە بە بەردەوامی فتیلەی شەرو ئاشووبی کەرکوك بووە، سوورە لە سەر دەست تێوەردانو ئانەوەی فیتنەو شەرو تێکدانی پەیوەندیی نێوان گەلانی کەرکوکو دژایەتیکردنی کورد.

تورکمان وەك پێکهاتەیەکی ئەم شارە، بوون بە دوو بەشەوە. شەقامی تورکمانی بە لایەك، بەرەی تورکمانی بە لایەکی تر. تا ئەمرۆ بەرەی تورکمانی تەنها تێروانینی ئەوەیە کەرکوك نەدرێت بە کورد. لێرەدا لەگەل ئەوەی تورکمان لە کەرکوکدا ئازادە لە سەر ئەوەی چی دەوێتو چۆن بیر دەکاتەوە، چونکە ئەم ئازادییە لە بیرکردنەوەو تێروانیندا یەکێکە لە گرنگترین سیماکانی شارستانییەتی نوێ، دەبێت کورد زۆر بە دلفراوانییەوە قبوولی بکات، ئەگەرچی لە دژیشی بێت. لەگەل ئەوەشدا لەم شارەدا بیرکردنەوەی بەرەی تورکمانی لە بەرژەوەندیی تورکمانی عێراقدایەو نە خزمەت بە گەلی تورکمان دەکات لەو شارەدا. تەنها رەنگدانەوەی خەونێکی کۆنی دەسەلاتی عوسمانیو حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی تورکیایە، کە بە بەردەوامی تورکمانی عێراق، کەرکوکیان کردووەتە قوربانیی بەرژەوەندییە بالاکانی حکومەتی تورکیا.

بۆیە دەبینرێت بەرەی تورکمانی رۆژ بە رۆژ زیاتر نالۆجیکی لە تێروانینو ناراستی لە هەلسوکەوتیدا دەکەونە روو، نییەتە خراپەکانیان زیاتر دەردەکەوێت، تا ئەو رادەیەی رقو کینەیان ئەوەندە قوول دەبێتەوە، کە ناتوانن رووی دوژمنکارانەیان بشارنەوە، بە ئاشکرا دەلێن: ئێمە پێمان باشە کەرکوك بچێتە سەر نەخشەی چین نەك بگەرێتەوە بۆ سەر هەرێمی کوردستان. ئەمانەو دەیان نموونەی تر خواستی تورکیای ئەتاتورکین نەك گەلی تورکمانیی کەرکوك. هەموو داواکارییەکانیان تەنیا بۆ بەرژەوەندیی دەسەلاتی تورکیایەو بە زیان بۆ هەردوو گەلی کوردو تورك لە کەرکوك دەشکێتەوە، بەلام ئەوەی مایەی نیگەرانییە بەشێك لە تورکمانی ئەم شارە کەوتوونەتە داوی ناحەزانو بوون بە ماشەی دوژمنانی کوردو تورکمان.

تورکیا هەتا ئەمرۆش بە گشتی تورکمانی کەرکوك بۆ دوو ئامانجی دیاریکراو بەکار دەهێنێت:

یەکەم: بەمەبەستی گوشار دروستکردن لە سەر عێراقو کورد بۆ بەردەوامبوون لە سەر هەناردەکردنی نەوتی کەرکوك لە رێگای تورکیاوە بۆ بەندەری جیهان، کە ئەمە بۆ خۆی داهاتێکی دارایی مەزن بۆ دەولەتی تورکیا دابین دەکاتو بە شێوەیەکی سەرەکیی سوودی لێ دەبینێت.

دووەم: تورکیا گوشار بۆ کوردی عێراق دەهێنێت. بۆ ئەوەی کیانێکی کوردیی لە باکووری عێراق دروست نەبێت، چونکە ئەمە بە هەوێن دەزانێت بۆ دروستکردنی کیانێکی کوردی لە تورکیا، کە تا ئەمرۆش زیاتر لە سی ملیۆن کورد لە تورکیا دەژینو بە تورکە شاخاوییەکان ناودەبرێن، لەگەل ئەوەشدا کەمترین ماف چارەی خۆنووسینیان نییە. تەنانەت مافی دەرهێنانی ناسنامەی کوردایەتیو قسەکردنیشیان بە زمانی کوردی نییە. لێرەدا سەیرو سەمەرە لەوەدایە، کە تا ئەمرۆ (سەرەتای هەزارەی سێیەم) عەقلییەتێکی سیاسیی ئینسانی وا مابێت، یان عەقلییەتێك تا ئەمرۆ بە شێوازی سەدەی نۆزدە بیربکاتەوەو ئەو هەموو گۆرانکارییە مەزنانەی دونیا کاری تێنەکات. زەمەنێك لە خەیال بۆ خۆی بونیاد بنێت، کە هیچ پەیوەندییەکی بە دونیای واقیعەوە نەبێت. لە هەمان کاتیشدا بیەوێت لە سیستمێکی جیهانیی گەورەی وەك یەکێتی ئەورووپا بەشداربێت.

کورد لەم شارەدا، لە دوای دارمانی رژێمی بەعسەوە زۆر بە هێمنی کار بۆ دەستخستنی مافەکانی خۆی دەکات. زۆر بە لێبووردەییەوە کارەکانی رۆژانە بەرێوە دەبات، ئەگەرچی هەندێك لاوی خوێن گەرمی کورد، ئەم سیاسەتەی ئیدارەی کوردی بە هەلە دەزانن پێیان وایە دەبێت کورد لەوە زیاتر زولم قبوول نەکاتو خیانەت لە هاوژیانانی نەکات. ئەویش دەستبکات بە کاری تیرۆریستیو تۆلەسەندنەوە، بەلام لە راستیدا کورد بە هەلبژاردنی رێگای ئاشتیو سیاسیی بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەکانو گرتنەبەری رێبازی دلفراوانیو لێبووردەیی، دەتوانێت خۆی بگەیەنێتە هاوشانی گەلانی هاوچەرخ. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کورد دەستبەرداری کەرکوك دەبێت، بەلکو کەرکوك بە بەشێکی دانەبراو لە کوردستان دەزانێتو بە هیچ شێوەیەك ئامادە نییە دەستبەرداری ببێت. نەك ئێستا بگرە بە درێژایی مێژووی خەباتو رزگاریی بە بەردەوامی لە سەر کەرکوك گرفتی لەگەل حکومەتە ناوەندەکاندا هەبووەو چەندین جار شۆرشو رۆلەکانی کردووەتە قوربانی ئەم مافەی خۆی.

ئەمرۆ بە گشتی، هەر دوو دەسەلاتی تورکمانیو عەرەبی ناتوانن لەو راستییە تێبگەن، کە هەزارەی سێیەم سەردەمێکی جیاوازە لە سەدەی بیستو جارێکی تر زەمەن ناگەرێتەوە دواوە. ئەمرۆ مرۆڤایەتی بیرو تێروانینی خۆیان لە سەر ئایدیاو بیرێکی تەواو جیاواز دامەزراندووە. سەردەمی دەسەلاتی دیکتاتۆریی بەسەرچووە، ئەو دەسەلاتانەی، کە هەتا ئێستاش ماون (وەك ئێرانو تورکیاو سوریا) دەبێت چاوەروانی کۆتایی ژیانی خۆیان بن. لەم سەردەمەدا، مرۆڤایەتی بە هەر شێوەیەك بێت داهاتووی خۆیان لە سەر بنەماکانی رێزگرتن لە مافی مرۆڤ و دیموکراسییەتو دارمانی جبەخانەی چەکسازییو چەکی کۆمەلکوژ دادەمەزرێنن. زۆرجار باس لە کەرکوك دەکرێت وەك بچووککراوەی عێراقێکی گەورە. بۆیە ئەم شارە سەرجەم کێشەو گیرو گرفتەکانی عێراق لەخۆ دەگرێت. لەمەش زیاتر، لە عێراقدا

کەرکوک خاڵی ڕووبەڕووبوونەوەی ناکۆکیی نێوان گەلانو ئایینەکانە. بەمەش کەرکوک دەبێتە نموونەی پێکەوە ژیان، یان هۆکارێك بۆ سوتانی هەمووان.

ئەمڕۆ لە کەرکوك نەتەوەکانی کوردو عەرەبو تورکمانو ئاشووریی دەژین. ئەمە جگە لە چەندین ئایینو مەزهەبی جیاواز، لەوانە ئیسلامو مەسیحیو سابئیو کاکەییو شیعەو سووننە.. هتد. لەم هەمە جۆرییەدا دەبێت مرۆڤی نموونەییو باڵا بین هەتا بتوانین پێکەوە هەڵبکەینو تەبا بینو درێژە بەژیان بدەین. مرۆڤەکانی کەرکوك دەبێت هەمەجۆریی ئەم شارە لە هۆکارێکەوە، کە بۆ ناکۆکیو شەڕو پێکهەڵپژانە، بگۆڕن بە هۆکارێك بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی زۆر جوانترو تەباتر لەوانی تر.

گەلانی کەرکوك چۆن دەتوانن بین بە داردەستی بێگانەو دوژمنانو ببنە ماددەی سەرەتایی شەڕو پووشی ئاگری یەکترکوژی، لە بری ئەمە دەتوانن ببنە هۆکارێك بۆ دنیایەکی زۆر جوانو نموونەیی، زۆرجار لە مێژووی پەیوەندییەکانی ئەم گەلانەدا وێنەی زۆر جوان دەرکەوتووە. لە کاتی بۆنەکانی خۆشیو ناخۆشیدا جیرانەکان بێ جیاوازیی نەتەوەو ئایینو ڕەگەزو بیروڕا، بوونەتە برای یەکترو یارمەتی یەکیان داوە. لە بازاڕو گەڕەکەکاندا زۆر جار ئەو وێنەیە دەبینرێت، کە دەگمەنە لە هیچ شوێنێکی تری ئەم دونیایەدا بەم شێوەیە هەبێت، کە دوو کەس پێکەوە دەدوێنو سێ زمان تێکەڵ دەکەنو جوانترین پێکهاتەی لێ دروستدەکەن.

لەگەڵ ئەوەی ڕۆشنبیرانی کورد لە ئەمڕۆدا زیاتر هەوڵی دروستکردنی گیانی پێکەوە ژیانو تەبایی نێوان گەلانی کەرکوك دەدەن، بەڵام هەندێك جار بۆ ئەم مەبەستە ڕاستییەکان دەشێوێنن. بە تایبەتی بەمەبەستی ڕازیکردنی تورکمانەکان تا پاشماوەی ئەو ڕقەی لێبێتەوە، کە ڕۆژگاری ڕەشی دەسەڵاتە دیکتاتۆرییەکان لە مێشکیاندا چاندوویانە. بێ لێکدانەوەو بەدواداچوون دەکەونە پاڵپشتی تورکمانو کورد بەوە تاوانبار دەکەن، کە نەیتوانیوە تورکمان بە لای خۆیدا ڕابکێشێت، لە بری ئەوەی بیکاتە دۆستی خۆی کردوویەتی بە ناحەزی خۆی، بەڵام ئەمە ڕاستییەکی ناتەواوە، چونکە مەرجەکانی شەڕو ناکۆکی مێژوویەکی زۆر کۆنترو قووڵتری هەیە. هاوکات هەندێك ڕووداوو کارەسات دووبارەبوونەوەی هەمان ئەو ڕۆژە ڕەشانەن، کە لە ساڵی (١٩٥٩)دا تەرو وشکیان پێکەوە سووتاند. ئەمڕۆ بە هەمان شێوەی ڕۆژانی پێش ڕووداوەکەی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٩)، کە کارەساتی کوشتارو شەڕو نارەحەتی بۆ هەردوو نەتەوە دروستکرد. ئێستا کۆمەڵێك دروستبوون بە هەمان ئاراستەو عەقڵییەتی ئەو کاتە هەڵسوکەوت دەکەنو ڕۆڵێکی باڵایان هەیە لە دووبارەکردنەوەی ئەو ڕۆژە ڕەشانە. ئەگەر ئەمڕۆ بە پەلە بە هەڵسوکەوتی هەندێك لە تورکمانە تۆرانییانەدا بچینەوە، کە تا ئەمڕۆش بە عەقڵیەتی سەردەمی عوسمانی بیردەکەنەوەو وا دەزانن ئێستاش (عەهدی بائید)ە، دەبینین بە فەرمانی تورکیاو عەقڵیەتی پاشماوەی تۆرانچییەتی هەڵسوکەوت دەکەن.

*** بەشی یەکەم: تورکمانە شۆڤێنیستەکان پووشی شەڕ دادەنێن:**

ماوەی دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام، واتە لە ساڵی (٢٠٠٣)ەوە بەمەبەستی تێکدانی باری ئارامی ئەم شارە، بۆ بەرژەوەندیی وڵاتانی دەوروبەر بەنانەوەی شەڕو ئاشووبو دروستکردنی هۆکارێك بۆ تێکدانی پەیوەندیی نێوان گەلانی کەرکوك، چەندین گرووپو لایەن لە ژێر چەندین ناودا دامەزران، بگرە دەیان ڕێکخراوو دامەزراوەی بە ناو مەدەنیو خزمەتگوزاری دامەزران، بەڵام لە ڕاستیدا ئەرکو گرنگی ئەمانە تەنیا کاری سیخوڕیو پێگەی ئامادەکردنی کردەوەی تیرۆرستیو ئاژاوەنانەوە بوون. لێرەدا بەمەبەستی زیاتر تێگەیشتنو بەرچاوڕوونی مشتێك لەو پیلانو کردەوە قێزەونانە دەخەمەڕوو. ئەمەش لەبەر ئەوەی زۆرێك لەو فیتنەو ئاشووبانە لەلایەن کەسێکەوە، یان لایەنێکەوە ئەنجام دەدرێت. چەندێك دژی کوردە، لەوەش زیاتر دژی بەرژەوەندیی گەلی تورکمانو پێکەوە ژیانی گەلانی کەرکوکە. ئەمەش زیاتر بەمەبەستی پەردە هەڵماڵینە لە سەر ڕاستییەکان، نەك بەمەبەستی نانەوەی شەڕو پشێویی.

لێرەدا ئەوەی مایەی نیگەرانییە ئەوەیە، کە هەندێك لایەنی سیاسیی تورکمانەکان بوون بە سیخوڕی تورکیاو بە هەمان شێوەی ساڵی (١٩٥٩) کەوتوونەتە کار بۆ نانەوەی شەڕو ئاژاوەو ناڕامیی، ئەم لایەنانە بوون بە دوو بەشەوە. بەشێکیان بە ڕێگای سیاسیی لە ناو ئیدارەو دەسەڵاتدا بەردەوام گرفتو کێشە دروست دەکەنو بەشێکیشیان چوونەتە پاڵ بەرەی تیرۆرو ئاژاوەچییەکانو عەرەبە توندڕەوەکانی سوونەو شیعەوە. ڕۆڵێکی بەرچاویان لە دروستکردنی ئەو بارودۆخە ناهەموارەی ئەمڕۆی کەرکوکدا هەیە.

ئاژاوەچییەکانی بەرەی تورکمانیو هاوبیرەکانیان لە دوای ڕووخانی بەعس بە فەرمانی دەزگا هەواڵگرییە سیخوڕییەکانی تورکیا سەنگی چالاکییەکانیان بردە شاری کەرکوکەوە. بە هەمان شێوازی ساڵی (١٩٥٩) لەگەڵ عەرەبە تیرۆریستە توندڕەوەکاندا دەستیان تێکەڵکردو کەوتنە خۆشکردنی ئاگری شەڕ. بە پێچەوانەی گەلی تورکمانەکانو بەرژەوەندییەکانی هەڵسوکەوت دەکەن. کەسانی تۆرانیچ وەك گرووپ، یان وەك تاك، دژایەتیکردنی کوردو گەلی تورکمانیان کردووەتە بەرنامەو ستراتیجییەتی کارکردنیان. لەم ڕووەوە لە ڕاپۆرتی دەزگا هەواڵگرییەکاندا ڕۆژانە چەندین جار تۆمار دەکرێت. بۆ نموونە لە یەکێك لە ڕاپۆرتەکاندا باس لە کەسێکی تورکمانی دەکات بە ناوی (ن)ەوە، کە لە سەر ڕێگای بەغداد نیشتەجێیەو یەکێکە لە ئەندامانی بزووتنەوەی وەهابی. ئەرکی سەرەکی ئەم کەسە کڕینی چەکو تەقەمەنییو بۆمبە بە ناوی جیهادەوە بۆ تیرۆرستان.

لە (١٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٣)دا پارێزگاری کەرکوکو جێگرەکەیو سەرۆکی ئەنجومەنو چەند ئەندامێکی ئەنجومەنو کاپتن مێلڤیل چوونە ناو گوندی بەشیرەوە. بەمەبەستی جێبەجێکردنی ئەو ڕێککەوتننامەیەی، کە لە

(٧)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٣)دا بەسترا. بۆ گەڕاندنەوەی ئەو عەرەبانەی، کە بەعس لە جێگای تورکمانە شیعەکان لە دیالەوە هێنابوونییە گوندی بەشیرو دەوروبەرەکەی. بەمەبەستی تەعریبکردنی ئەو ناوچەیە جێنشین کرابوون‌و گەڕاندنەوەی تورکمانەکان بۆ جێگاو زێدی خۆیان، بەڵام ئاژاوەچییەکانی بەرەی تورکمانی دەچنەپاڵ عەرەبە شۆڤینیستەکان‌و ناهێڵن ئەم ڕێککەوتنە سەربگرێت. بۆیە قەنبەر (نوێنەری شیعەی تورکمان) جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە، کە عەشیرەتەکەی چەکدارن‌و لە ئەمڕۆ بە دواوە بۆ وەرگرتنەوەی ناوچەکەیان هێز بەکاردەهێنن.

لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٣)ەوە ئاژاوەچی‌و نیگەرانکردنی تۆرانییەکان‌و عەرەبە شۆڤێنیستەکان بەبەردەوامی لە زیادبووندا بوون. ڕۆژانە دەیان پیلان‌و نەخشەی دوژمنکارانەی نوێیان بە بەرگو شێوەی هەمەجۆرەوە دادەهێناو داهێنانی مەزنترو پیلانی پێشکەوتووتریان دەدۆزییەوە. بۆ ئەوەی ئەو فەزایە بخولقێنن، کە براکانی ئەم شارە بکەونە یەکتر کوشتن‌و شکاندنی یەکترو سووتاندنی هەموو جوانی‌و پیرۆزییەکانیان.

لە (١٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٣) لە دوای نوێژی هەینییەوە لە شەقامی ئەتلەس (لە حوسێنییەی پشت فەرمانگەی ڕەگەزنامە) ڕێپێوانێك بە بەشداریی لایەنگرانی (مقتدی الصدر)و عەرەبەکانی حەویجەو تورکمانەکان ڕێکدەخرێت. ئەو کات بەڕێوەبەری نووسینگەی سەدر لە کەرکوك، کە (عەبدولفەتاح ئەلموسەوی) بوو لەگەڵ هێزەکانی هاوپەیمانان ڕێکدەکەوێت لە سەر ئەوەی ئەوان پارێزگاریی‌و پاراستنی ئەو ڕێپێوانە بگرنە ئەستۆی خۆیان، بەڵام دواتر عەبدولفەتاح ڕێگا دەدات بە خۆپیشاندەران چەك لەگەڵ خۆیاندا هەڵبگرن. ڕێپێوانەکە دەبێتە ڕێپێوانێکی چەکداریی‌و کۆتاییەکەی بە تەقەکردن‌و نانەوەی پشێوی تەواو دەبێت. لەم ڕێپێوانەدا بەشداربووان داوای ئازادکردنی بەندکراوە تیرۆریستەکانیان‌و گەڕانەوەی دەرکراوە بەعسییەکان دەکەن بۆ فەرمانگەکانی حکومەت. لە دوای گۆڕینی ئەندامانی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك بە ڕاپۆرت‌و خۆپیشاندان داوای دەرکردنی پۆلیسە کوردەکانی کەرکوك دەکەن‌و داوای سڕینەوەی ناسنامەی کوردایەتیی کەرکوك دەکەن.

لە (٢٤)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٣)دا بەرپرسەکانی بەرەی تورکمانەکان درۆیەك دەخولقێنن. سەرجەم بارەگاکانی خۆیان لە کەرکوك لەوە ئاگادار دەکەنەوە، کە کوردەکان بە نیازن هێرش بکەنە سەریان. بۆیە بڕیارێك بە سەر هەموو خەڵکیدا دەردەکەن، کە هەر کەسێك لە جەژنی قورباندا چەك هەڵبگرێت بۆ شەڕی دژ بەکورد ئەوە بڕی سەد دۆلار خەڵات‌و بڕێك خۆراك وەردەگرێت. هاو کات دەتوانێت لە سەر خەرجی بەرەی تورکمانی سەفەرێك بۆ تورکیا بکات.

لە هەمان ڕۆژدا بە هاندانی بەرەی تورکمانی سەدو پەنجا خوێندکارو هاوولاتی لە بەردەم پارێزگای کەرکوکدا کۆدەبنەوەو دروشمی دژ بە عەمیدی پەیمانگای هونەرە جوانەکان دەڵێنەوە. لەو کاتەدا هەندێك لە ئەندامانی بەرەی تورکمانی هەوڵ دەدەن ئەم نارەزایەتییە بکەن بەقەیران، ئاگرو شەڕی ناکۆکی دابگیرسێنن. هاوکات هانی نەتەوەکانی تری کەرکوك دەدەن بۆ دژایەتیکردنی کوردو نانەوەی شەڕو ئاژاوە لە ناو پەیمانگەکەدا. بەمەبەستی تێگەیشتن لەم گرفتە دوای ئەو خۆپیشاندانە دەزگا هەواڵگرییەکانی کەرکوك چاوپێکەوتنێك لەگەڵ عەمیدی پەیمانگاکەدا ئەنجام دەدەن. عەمید (م.ح) لە وەڵامدا دەڵێت: من کۆمەڵێك بەڵگەنامەو سیدیم لایە، کە ئەم خوێندکارانە چۆن بۆ بەرژەوەندی بەرەی تورکمانی‌و لایەنە تیرۆرستییەکان کار دەکەن‌و ئاژاوە دەنێنەوەو هەوڵی دروستکردنی دووبەرەکی لەنێوان خوێندکارە کوردەکان‌و تورکمانەکان‌و عەرەبەکان دەدەن‌و چەندین نامەی هەڕەشەو جنێویان بۆ من ناردووە. ئەم نموونەیە دووبارەبوونەوەی هەمان ڕووداوی خوێندنگای موسەڵایە، کە لە ساڵی (١٩٥٩) لەلایەن تۆرانییەکانەوە دروستکرا.

عەرەبە توندڕەوەکان‌و عەرەبە هاوردەکانی کەرکوك‌و تورکمانە تۆرانییەکان پلانێك دادەنێن بۆ ئەنجامدانی خۆپیشاندان‌و ڕێپێوانێك، بەمەبەستی دژایەتیکردنی سسیمی فیدراڵییەت، بۆ ئەم مەبەستە لە (٣١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٣)دا کۆمەڵێك لە بەرەی تورکمانی لە بەرگی هاوولاتیدا ڕێپێوانێك سازدەکەن، لەو کاتەشدا ژمارەیەکی زۆر لە شێخەکان‌و عەرەبەکانی حەویجەو دەوروبەری بە بەرنامە دەگەنە کەرکوك بۆ بەشداری لەو ڕێپێوانەدا، عەرەبەکان بە فەرمانی (ش. و. ع) بەشداری دەکەن. تورکمانەکانیش لەلایەن بەرەی تورکمانییەوە ڕێنمایی‌و فەرمان وەردەگرن، دواتر چەندین کەسی تیرۆریست‌و توندڕەوی ئیسلامیی دێنە ڕێپێوانەکەوەو بە تەواوی ئاراستەکەی دەگۆڕن. بەرەی تورکمانیش بۆ زیاتر قووڵکردنەوەی قەیرانەکە ژمارەیەك چەکدار دەخاتە نێو ڕێپێوانەکەوەو ئاراستەی بەرەو بارەگای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەبات‌و تا دەگاتە بەردەم بارەگاکەو هەندێك چەکدار دەست دەکەن بە تەقەکردن لە بارەگاکە، بەڵام دواتر مەفرەزەیەك لە هێزەکانی (KBI) خۆپیشاندانەکە لەو جێگایە دووردەخەنەوەو کۆتایی پێدەهێنن.

لە (٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤) کۆمپانیایەکی تورکی بۆ دروستکردنی مۆبایل دەیەوێت بێتە کەرکوك‌و لە ناوچەی پیشەسازی بەشێك بکاتەوە. ئەم کۆمپانیایە لە ڕێگای ڕێکخەرێك بە ناوی (ئا)، کە تورکمانی کەرکوکەو پێشتر لە دەزگای هەواڵگریی تورکیادا کاری دەکرد سەرپەرشتی دەکرێت. بۆ ئەم مەبەستە سەردانی پارێزگای کەرکوك دەکەن‌و جێگری پارێزگا (ئیسماعیل حەدیدی) دەبینن، بەڵام دواتر دەردەکەوێت، کە ئەم کۆمپانیایە ئەوەندەی ئامانجی سیاسی‌و سیخوری‌و نانەوەی ئاشووبی لە پشتەوەیە، ئەوەندە بە هۆکاری بازرگانی نەهاتووە. بۆیە هەوڵەکانی شکست دەخوات‌و ڕێگایان پێنادرێت لە کەرکوك بارەگا بکەنەوە.

لە هەمان ڕۆژدا دەزگا هەواڵگرییەکانی کەرکوك ئەو زانیارییانەیان پێدەگات، لە گوندی ساری تەپە، کە دوو

کیلۆمەتر لە کەرکوکەوە دوورە، برێك موشەك لە ژێر زەویدا شاردراوەتەوەو دواتر دەزگا ئەمنییەکانی کەرکوکی لێ ئاگادار دەکرێتەوەو دەست بە سەریدا دەگیرێت.

لە (٨)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤)دا کۆمەڵێك لە ئەندامانی رێکخراوی تیرۆرستی (ئەنسارولئیسلام) لەگەڵ گرووپێك لە تورکمانەکان لە ماڵێکیدا لە قەڵا کۆدەبنەوەو جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە، کە کوشتنی سەربازەکانی هاوپەیمانان و ئەوانەی هاوکاریان دەکەن حەڵاڵەو جیهادە.

شایەنی باسە، ئەو ماڵە مولکی کەسێکە، کە ناوی (ج) تورکمانەو لە (٣١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٣) بە واتا لە رۆژی خۆپیشاندانەکەدا، ووردتر لە دوای تەواوبوونی کۆمەڵێك چەکو تەقەمەنی بۆ ئەو ماڵە دەهێنێت.

لە کەرکوك کۆمەڵێك لە دەوڵەمەندەکانی تورکمان بە هاوکاری بنەماڵە عەرەبەکانی عوبێدو هەندێك لە توندرەوە نەتەوەییەکان بریار دەدەن بەرەیەك پێکبهێنن بۆ دژایەتی کوردو نانەوەی شەرو ناکۆکی لەنێوان کوردو عەرەبدا. هاوکات هاوکاریو پاڵپشتی رەوتە ئیسلامییە توندرەوەکان بکەن و یارمەتی دارایی و چەکیان بۆ دابین بکەن، لە سەر ئەم دۆخە یەکێك لە سەرانی تۆرانییەت دەڵێت: ئێمە ئەگەر لە بەرانبەر عەرەبدا شکستمان هێناوە، دەبێت لە بەرانبەر کورد سەربکەوین، چونکە بەرژەوەندیی وڵاتی دایك (تورکیا) ئەمرۆ وای دەوێت، ئەمەش بۆ ئێمە ئەرکێکی نیشتیمانیو نەتەوەییە. لێرەدا نیازو تێروانینی ئەم گرووپە چۆن دەردەکەوێت، کەسانێك تورکیا بە وڵاتی دایکی خۆی بزانێت، دەبێت پێگەی لە عێراقدا چی بێت؟ ئایا دەکرێت بڵێین وتەکەی تاریق عەزیز راست دەرکەوت، کە وتی: تورکمانی عێراق هاووڵاتی تورکیان و لای ئێمە میوانن.

لە رۆژی (٢٣)ی ئابی ساڵی (٢٠٠٣) ئەندامانی بەرەی تورکمانی خۆپیشاندانێك ئەنجام دەدەن، لەو رۆژەدا ئۆتۆمبیلێکی جۆری بی ئێم دبلیو دێتو لە بەردەم تەلاری چادرچی نزیك تەلاری پارێزگا، دەست دەکات بە دابەشکردنی چەك بە سەر خۆپیشاندەراندا، ئەمە جگە لە چەند کۆگاو دوکانێك، کە خاوەنەکانیان سەر بە بەرەی تورکمانین و لەو جێگایەدان و لە دوکانەکانیانەوە چەکو تەقەمەنی بە سەر خۆپیشاندەراندا دابەشدەکەن، لەوانە (خ. ئا)و کورەکەی. دواتر تەقە دەستپێدەکات، ئاژاوەچییەکان رووی تفەنگەکانیان دەکەنە پاسەوانەکانی پارێزگاو دەزگای هەواڵ بۆ رۆژنامەوانی. شایەنی باسە دەزگای راگەیاندنی هەواڵ ئەو کات تەنها یەك پاسەوانی چەکداریشی نەبوو. بۆیە دەرگاکە لە سەر خۆیان دادەخەن، تا سوپای ئەمەریکاو پاسەوانەکانی پارێزگار دێن و فریایان دەکەون و ئاژاوەچییەکان راودەنێن.

زۆرێك لە کردەوەکانی بەرەی تورکمانی دووبارەکردنەوەی هەڵسوکەوت و هەمان سیاسەتی تۆرانییەکانی ساڵی (١٩٥٩)یە، ئەمرۆ بەرە دەیان رێککەوتننامەو گرێبەستی ئاژاوەگێریی بۆ تێکدانی پەیوەندیی برایەتی نێوان کوردو عەرەبو تورکمان لە کەرکوکدا ئەنجام دەداتو بە بەردەوامی هەوڵی پرچەککردنی ئاژاوەچێتیو سیخورەکانی بێگانە دەدات.

یەکێك لەو رێککەوتننامانە گوژمەی کرینی چەکو تەقەمەنی بوو لە تورکیا، کە بە رێککەوتن لەنێوان بەرەی تورکمانیو عەشیرەتی عوبێد لە کەرکوك بە سەرپەرشتی تورکمانێکی کەرکوك بە ناوی (ش)ەوەو دوو ئەفسەری تورکمان بەرێوە دەچێت.

لایەنگرانی بەرەی تورکمانیو تۆرانییەکان بەمەبەستی نانەوەی ئاژاوەو ناکۆکی بێ شەرمو دوودڵی هەموو جۆرە کردەوەیەك دەکەن. ئەگەر کەسێك رۆژانە گوێی لە کەناڵەکانی راگەیاندنی بەرە بێت، ئەوا بۆی دەردەکەوێت ئەوانەی من دەیڵێم زۆر کەمترە لە راستی ئەو کردەوانە.

تۆرانییەکان لە پاڵ ئەنجامدانی کردەوەی تێکدەرانەو نانەوەی ئاشووب، ماوەیەکە دەستیان داوەتە رووخاندنی گۆری تورکمانەکانی خۆیان بەمەبەستی تاوانبارکردنی کورد. ئەمە جگە لەوەی گرووپێکیان پێکهێناوە بۆ دزینی ئۆتۆمبیلی دەوڵەمەندەکانی تورکمانەکان و دروستکردنی رووداوو گرفت لە نێو خوێندکارە کوردو تورکمانەکاندا لەو قوتابخانانەی کە منداڵانی کوردو تورکمان پێکەوە دەخوێنن.

لە (١٧)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٣)دا کۆمەڵێك خوێندکاری تورکمان لە ئامادەیی کەرکوك بەمەبەستی نیگەرانکردنی کردنی خوێندکارە کوردەکان هەڵدەستن بە نووسینەوەی تابلۆی ناوی قوتابخانەکە بە پیتی لاتینی. بۆیە خوێندکارە کوردەکان داوادەکەن ئەو لافیتانە دابگرن و نووسینەوەی ناوی قوتابخانەکەیان بە لاتینی بسرێتەوەو دواتر لە رۆژی دوایدا لە (١٨)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٣)دا سەرۆکی بەرەی تورکمانەکان (فاروق عەبدولرەحمان) دێتە ئامادەیی کەرکوك بەمەبەستی چارەسەرکردنی کێشەکە وەك ئەوەی کاك فاروق بەرێوەبەری پەروەردەی کەرکوك، یان بەرپرسێکی پۆلیس، یان ئاسایش بێت، بەڵام کێشەکە قووڵتر دەبێتو دواتر زۆر بە نارەحەتی ئاگری ناکۆکییەکە دەکوژێتەوە. ئەم رووداوە هاوشێوەی رووداوەکەی شەری نێوان مامۆستاو خوێندکارە تورکمانەکانی قوتابخانەی موسەڵلا بوو، کە لە ساڵی (١٩٥٩) دا لەنێوان چەند خوێندکارێکی تۆرانیو مامۆستا (سەنییە جەباری)دا لە ئاکامی فیتنەو پیلانی تۆرانییەکانی ئەو کاتەدا دروستبوو.

(س. ح. ق) پێشتر ئەندامی فەرماندەیی فیرقەی حیزبی بەعس بوو. ئەمرۆ بە یەکێك لە سەرانی تۆرانچییەتی دادەنرێتو بە بەردەوامی خەریکی نانەوەی ناکۆکیو فیتنەیە لەنێوان کوردو تورکمانەکان و چەندین پیلان و نەخشە بۆ دژایەتیکردنی کوردو ئەمەریکا بەرێوە دەبات. لەوانە لە ماوەی پێشووودا دەچێتە ناحیەی دوبزو خورماتوو، لەوێ بە نهێنی چاوی بە چەندین سەرەك عەشیرەتی عەرەب دەکەوێتو هەوڵدەدات بیانهێنێتە سەر ئەو باوەرەی عەرەبە هاوردەکان کەرکوك بە جێ نەهێڵن و نەگەرێنەوە بۆ جێگاو شوێنی خۆیان و داوایان لێدەکات لە کەرکوکدا بمێننەوەو لەگەڵ تورکمانەکاندا یەك ریزییەك دروستبکەن بۆ لێدانی کوردو دەرکردنیان لە کەرکوك، هەروەها لە کۆبوونەوەیەکدا ئەوە ئاشکرا دەکات، کە داوایان لە تورکیا کردووە هێزو

پاڵپشتی دارایی‌و چەك بۆ توركمانەكان دابین بكات‌و توركیاش پەیمانی هاوكارییان پێ دەدات. دواتر (س) بە شێوەیەكی نهێنی سەردانی ناوچەكانی ئاڵتون كۆپری‌و داقووق‌و تازەو حەویجەو ریازو لەیلان دەكات‌و بانگەشە بۆ هەمان مەبەست دەكات. لە شەوی (١٥) لەسەر (١٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٣) كۆبوونەوەیەكی نهێنی لەماڵی (م. ص. ك)ی خاوەن كۆمپانیای (سم تك)ی توركی رێكدەخرێت. ئەم كۆنفرانسە لە كاتژمێر حەوتی ئێوارەوە دەستپێدەكات‌و كاك فاروقی بەرپرسی بەرەی توركمانی‌و وەلید ناوێك، كە بازرگان‌و بەڵێندەرە لەگەڵ (خ. ئا)و (م) برای (م. ص. ك)و (ف. ق)و (ص) خاوەن دەرمانخانەی (ص) تیایدا بەشدار دەبن.

لەم كۆبوونەوەیەدا گفتوگۆ لە سەر چەندین باس دەكرێت، لەوانە:

١. باسی سەباح قەرە ئاڵتون: لەم كۆبوونەوەیەدا بەشداران باسی ئەو چالاكییانە دەكەن، كە بۆ گەرانەوەی سەباح‌و دژایەتیكردنی كوردەكان ئەنجامیان داوە لە بەرانبەر دوورخستنەوەی سەباح لە پۆستەكەی، هەروەها بریاردەدەن بۆ ئەو مەبەستە رێپێوانێك ئەنجام بدەن لە (١٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٣)دا.

٢. باسی بانگهێشتنامەی جۆرج: گفتوگۆكردنی ئەو باسەی، كە پەیوەستە بە دەعوەتكردنی جۆرجەوە لە رێگای (ع. ص) بۆ توركیا، بە ناوی بازرگانییەوە. لەم بارەیەوە سەرۆكی بەرەی توركمانەكان (فاروق) لە دانیشتنەكەدا ووتوویەتی: ئەگەر ئەم سەفەرە سەركەوتوو بێت، ئەوا كۆنترۆڵی ئابووریی كەركوك دەكەین، هەروەها دەیبەینە لای بەرپرسانی تورك‌و بە برێك پارە چاوتێری دەكەین، بۆ ئەم مەبەستەش گلۆپی سەوزمان لە توركیاوە بۆ هەڵكراوە.

٣. بریار لەسەر دروستكردنی نەخۆشخانەیەك لە رێگای مانگی سووری توركییەوە دەدرێت. ئەم نەخۆشخانەیە وەك پرۆژەیەكی خێرخوازیی ئەنجام دەدرێت، بەڵام ئەركی سەرەكی بۆ چاودێریی‌و سیخوری‌و ئەنجامدانی كاری نهێنی‌و تێكدەرانە دەبێت لە دژی نەتەوەكانی كەركوك‌و بۆ بەرژەوەندیی وڵاتی دایك، واتە بۆ توركیا.

ئەمانەو چەندین باسی تر لەم كۆبوونەوەیەدا لەلایەن بەشداربووانەوە قسەو گفتوگۆی لە سەر كرا، بەڵام سەرجەمیان بۆ مەبەستی تێكدانی باری ئارامی‌و سیاسیی كەركوك بوو لە دژی حكومەتی نوێ‌و گەلانی كەركوك. دواتر لە كاتژمێر نۆی شەودا كۆتایی بە دانیشتنەكەیان هێنا.

بە پێی ئەو زانیارییانەی بەردەست كەوتوون، ئەمانەو دەیان كردەوەی نادروست‌و پیلان، رۆژانە لە دوای ئەنجامدانی دەكرێن بە راپۆرت‌و نموونەیەكی لێ بەرز دەكرێتەوە بۆ دەزگا هەواڵگرییەكانی توركیاو فەرمانگەی باڵای هەواڵگریی سەربازیی توركیای لێ ئاگادار دەكرێتەوە.

لەو راپۆرتانەدا، كە لە رۆژانی سەرەتای رووخانی رژێمی بەعس‌و رزگاربوونی شاری كەركوكەوە لەلایەن سیخورانی توركیاو ئاژاوەچییەكانەوە نووسراو بەرزكراوەتەوە، لە (١٠)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٣) واتا تەنیا لە دوای چەند رۆژێك لە پرۆسەی رزگاریی عێراق، راپۆرتێك لەلایەن نوێنەری بەرەی توركمانییەكانەوە دەدرێتە سەرۆكی بەرەو دواتر نموونەیەكی لە رێگای ئەوەوە دەدرێتە دەزگای هەواڵگریی‌و سەربازیی توركیاو دەزگا ئەمنییەكانی باڵای حكومەتی توركی لەو راپۆرتەدا چەندین زانیاریی چەواشەكاریی‌و نادروست دەخەنەروو، كە سەرجەمیان بۆ خۆبردنە پێشەوەیە لە توركیاو وەرگرتنی پارەو پاڵپشتییە.

ئەمرۆ لە چاوەروانی دیاریكردنی چارەنووسی كەركوكدا هەندێك توركمان‌و عەرەب گەیشتوونەتە ئەو باوەرەی ناتوانن لە رێگای راپرسی‌و یاساوە رێگا لە گەراندنەوەی كەركوك بۆ سەر هەرێمی كوردستان بگرن. بۆیە بە زۆریی پەنا بۆ كاری ئاژاوەگێری، یان گوشاری سیاسیی دەبەن. لە هەندێك جاریشدا گرووپە تیرۆرستی‌و توندرەوەكان لە دژی خەڵكی هەژارو مەدەنی، پەنا بۆ كردەوەی زۆر نامرۆڤانە دەبەن.

ئەمە راستییەكی تاڵە، كە بە گشتی تێروانینی بەرەی توركمانی‌و عەرەبە توندرەوەكانە لە دژی بەرژەوەندییەكانی كورد. لە كاتێكدا ئەوەندەی توركمانەكان لای كورد گرنگن، ئەوەندە تێروانینی گەلانی تر گرنگ نییە، چونكە كورد، توركمانەكان بە هاوبەش‌و دۆستی نەك تەنها ئێستاو رابردووی خۆی دەزانێت، بەڵكو بۆ داهاتوو هەتاهەتایە دەبێت ئەم دوو نەتەوەیە لەم شارەدا پێكەوە بژین، بەڵام بە پێچەوانەوە بەشێك لە برا توركمانەكان بوونی كوردو پێكەوە ژیانیان لەگەڵیاندا بە نارەواو نادروست دەزانن. هاوشانی ئەم باوەرە هەندێك لایەنی سیاسیی توركمان وەك بەرەی توركمانی، كە تەنها لە سێبەری كورددا دەتوانن ژیانی سیاسیی خۆیان بگوزەرێنن‌و داوای ماف نەتەوایەتی‌و كۆمەڵایەتی‌و كولتووری‌و رۆشنبیریی خۆیان بكەن. لەگەڵ ئەمانەشدا كەوتوونەتە لێدانی كوردو بەرژەوەندییەكانی‌و بە راست‌و چەپدا بە هەموو چەكێك لێیان دەدەن‌و بەردەوام سوورن لە سەر ئەو درۆو پروپاگەندانە بەمەبەستی شێواندنی راستیی رێژەی كوردو توركمان لە كەركوكدا.

بوونی كورد لەم شارە نابینن‌و بە شارێكی توركمانی ناوزەد دەكەن. لێرەدا سەمەرەكە لەوەدایە، كە ئەو توركمانانە ئەوەندە كورت بین بن، درك بەوە نەكەن ئەمرۆ مرۆڤایەتی لە ئاستێكدایە رەنگە سرینەوە، یان كوشتنی تاكە كەسێك ئاسان نەبێت، یاخود كوشتنی رۆژنامەنووسێك ببێتە مایەی گرفت‌و كێشە بۆ وڵاتێك. كەچی ئەوان بیانەوێت ناسنامەی سەدان هەزار كەس بسرنەوەو پێداگریی لە بوونی نەتەوەیەك بكەن، كە هەموو رۆژە سەختەكانی سەدەی شەرو ناعەدالەتی سەدەی بیستەمی بە رێ خستبێت‌و كۆتایی نەهاتبێت. لە راستیدا ئەمە خۆگێلكردن نییە، بەڵكو ئەمە گێلیی تەواوە.

لە دوای دەركەوتنی ئاكامی دەنگدانەكەی ساڵی (٢٠٠٥) لە كۆی چل و یەك كورسیی ئەنجومەنی پارێزگا، تەنها نۆ كورسی بەركەوت. ئەمە لە كاتێكدا بۆ توركیا شۆكێك بوو. لایەنە سیاسییە توركمانییەكانیشی شەرمەزار كرد، هاوكات هۆكارێكیش بوو بۆ ئەوەی توركیا بە دروستیی قسە نادروستەكانی ئەمان بكات‌و تێروانینێكی تری هەبێت‌و ستراتیجییەتی مامەڵەكردنی خۆی لە سەر هەمان سیاسەتی

پێشووی نەهێڵێتو بگۆڕێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لە بازنەی دژایەتیکردنی کورد دەرنەچوو. لە دوای دەرکەوتنی ئەم ڕاستییانە بەرەی تورکمانی کەوتە پروپاگەندەو گلەییکردن لە ڕێژەی پلەو پایەی تورکمان لەم شارەدا، بەوەی زۆر لە قەبارەی خۆی کەمترەو کورد هەموو پۆستە گرنگو ناوەندو بچووکەکانی بۆ خۆی قۆرخ کردووە.

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم بیانووە ناڕاستو شەرانگێزییەی بەرەی تورکمانی، ئەم خشتەیەی خوارەوەو دواتریش چەند ڕوونکردنەوەیەکی تر دەخەینەڕوو:

١٤. بەڕێوەبەری دابەشکردنی کارەبای کەرکوك (یالچین مەهدی ڕەشید).

١٥. بەڕێوەبەری ئاماری کەرکوك (عەدنان ڕەزا بابا).

١٦. سەرۆکی توێژینەوەی کشتوکاڵیی (عەدنان فەتحوڵڵا).

١٧. بەڕێوەبەری پەروەردەی کەرکوك (شەن عومەر موبارەك).

١٨. بەڕێوەبەری خوێندنی تورکمانی (فاروق فوئاد).

١٩. بەڕێوەبەری وەقفی شیعی (حەبیب سەمین عەلی).

| نەتەوە - پلە | عەرەب | کورد | تورکمان | ئاشووری | کۆ |
|---|---|---|---|---|---|
| ئیدارەی گرنگو هەستیار | ٧<br>٣٥٪ | ١٥<br>٥٠٪ | ١<br>١٠٪ | ١<br>٥٪ | ٢٤ |
| ئیدارەی ناوەندە ئاساییەکان | ٨<br>٧٪ | ٣٠<br>٦٦٪ | ٨<br>١٧٪ | -<br>- | ٤٦ |
| ئیدارەی تووسینگە لاوازەکان | ٨<br>٢١٪ | ١٠<br>٢٦٪ | ١٩<br>٤٩٪ | ٢<br>٥٪ | ٣٩ |

ئەمەش ناوی ئەو کەسو پۆستانەیە، کە تورکمان لە کەرکوکدا هەیانە:

١. بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرکوك (تورهان عەبدولڕەحمان).

٢. یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستی (د. نەجدەت دەمیرجی).

٣. ڕاگری کۆلێجی زانست (د. عەباس حەسەن تەقی).

٤. کۆلێجی ئەندازیاری (د. موئەیەد قاسم).

٥. بەڕێوەبەری ڕێگاو بانو پردی کەرکوك (قاسم هەمزە ئەحمەد).

٦. فەرمانگەی خەزنەی نیشتەجێکردن (فەیزوڵڵا محەمەد ساڵح).

٧. بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی منالان (د. ئەزل مەهدی).

٨. بەڕێوەبەری ژینگەی کەرکوك (عەلی عەبدولڕەزاق عەبدولوەهاب).

٩. بەڕێوەبەری دەزگای خزمەتگوزاریو کەرەستەی نەوتی باکوور (ئەکرەم فوئاد).

١٠. بەڕێوەبەری دەزگای ئیدارەو یاسای نەوتی باکوور (جەودەت جرجیس مستەفا).

١١. بەڕێوەبەری پەیوەندیکردنو پۆستەی کەرکوك (عادل عەبدوڵڵا عەلی).

١٢. بەڕێوەبەری هێڵی ئاسنی کەرکوك (شاکر مەحمود شوکری).

١٣. بەڕێوەبەری شوێنەواری کەرکوك (ئەیاد فازیل).

٢٠. بەڕێوەبەری پلاندانانو ئاوەدانکردنەوە (ئەیاد سلێمان عەلی).

٢١. بەڕێوەبەری کۆمپانیای تەئمین (شەکرە عومەر).

٢٢. بەڕێوەبەری بانکی ڕافدین - سەرەکی (شەکیبە عەبدولعەزین).

٢٣. بانکی ڕافدین - جمهوری (موعتەسەم وەهاب).

٢٤. بەڕێوەبەری بانکی ڕافدین - ئاڵتونی ڕەش (غانم ڕەشاد).

٢٥. بانکی ڕەشید - ئەتڵەس (تاهیر محەمەد عەبدوڵڵا).

٢٦. بانکی ڕەشید - بابەگوڕگور (یاقوت شکر).

٢٧. بانکی ڕەشید - عرفە (محەمەد ئەسفەر یوسف).

٢٨. بانکی ڕەشید - یەکی حوزەیران (عەدنان عەبدولڕەحمان).

ئەم ڕێژەیە دەکاتە (٢٧٪)ی ئیدارییەکانی کەرکوك بە هەر سێ پلەکەیەوە، ئەگەر بە پێی ڕێژەی دەنگدان بێت ئەوا تورکمان ئەوەندەی بەرناکەوێتو یەکێك لە گرنگترینو هەستیارترین پلەو پایەی کەرکوك کۆمپانیای نەوتی باکوورە، کە کورد لەگەڵ ئەوەی زۆرینەی ڕەهایە لەم شارە، بەڵام بە قەد خوێی چێشتێك بوونی نییە تیایدا. لە دەستەی کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکاندا تورکمانەکان لە سەرجەم ئیدارەو لیژنەکاندا بوونی دیاریان هەبووە لە ئیدارەی گشتیدا، کە لە سێ کەس پێکهاتبوو، بەڕێوەبەرێکی کورد بە ناوی فەرهاد مەجیدو دوو هاوکار یەکێکیان بە ناوی ئیبراهیم

یونس (تورکمان) ئەویتریان بە ناوی نیهاد عەباس لە نەتەوەی عەرەب بوو، لە (یەکەکانی ئاسایش) سەرۆکی بەشەکە تورکمانە بە ناوی محەمەد حەمەد زینەل و جێگرەکەشی هەر تورکمان بوو بە ناوی نیهاد محەمەد کەمالەوە، لەم لیژنەیە تەنها یەك کوردیش نەبووە لە ئیدارەو بەڕێوەبردنیدا. لە رووی لۆجستییەوە سەرۆکی ئەم بەشە (لوجستی) عەرەب بوو، جێگرەکەی تورکمان بوو لە بواری ڕاگەیاندندا بەشی راگەیاندن سەرۆکەکەی کورد بوو، بەڵام هەردوو هاوکارەکەی بە ناوی تیمور عەبدوللاو نیهاد ئەکبەر تورکمان بوون. لەمەڕ پێکهاتەی ئالیاتی پۆلیسی کەرکوك جێگری بەڕێوەبەری پۆلیسی پارێزگا (لیوا تورهان)ە، کە تورکمانەو بەڕێوەبەری پۆلیسی بەلدەی کەرکوك ئەلسەید حاج بورهان تورکمانەو بەڕێوەبەری (حرکاتی نەجدە)، کە (ئامر قاتعی) خورماتوو، رائد عەباس پیاوێکی تورکمانە.

بەڕێوەبەری (ئالیاتی) پۆلیس عەقید جەمال تورکمانە. ئەمانەو دەیان ئەفسەری پلەدارو ئەفسەری ئاسایی تورکمان رۆڵی کاریگەرییان هەیە لە بەڕێوەبردنی کەرکوك، بەڵام جێگای نیگەرانییە بەشێکی زۆر لەو ئەفسەرانە فەرمانیان لە بەرەی تورکمانیو تورکیاوە وەردەگرن، نەك لە گەورە بەپرسانی پۆلیسی کەرکوكو بەغدادەوەو بەردەوام لە بەرەی دژ بە ئاسایشو ئارامی کەرکوك هەڵسوکەوت دەکەنو هەندێکیان بە ئاشکرا دژایەتی هاوولاتییە کوردەکان دەکەنو چەندین شەڕو ناکۆکی دامەزراوە. لە بەر ئەوەی کاروباری هاوولاتییە کوردەکان لەو فەرمانگانەی ئەوانی لێیە جێبەجێ ناکرێت، یان دوادەخرێت، یان ون دەکرێتو هەندێك جار هاوولاتیانی کورد رووبەڕووی سووکایەتیپێکردن دەبنەوە.

من باسکردنی ئەم ڕاستییانەم بۆ ئەوە نییە، کە دژایەتیو ناکۆکی لەنێوان کوردو تورکماندا دروستببێت، یان زوڵم لێکراوان بچن تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، بەڵکو بۆ ئەوەیە ئەو ڕاستییە دەربکەوێت، کە هەر ئەم هۆکارو مەرجانە بوون، کە شەڕو کوشتارەکانی ساڵی (١٩٥٩)ی دروستکرد، کە تا ئەمڕۆش ئێمە تەنیا هەردوو نەتەوە پێکەوە لەو رووداوە زەرەرمەندبووین. بگرە ئەمڕۆش هەر ئێمە باجەکەی دەدەینو بێگانەو دوژمنانی گەلانی کەرکوك بەرهەمەکەی دەخۆنو سوودی لێ دەبینن.

ئەمڕۆ پەیوەندییەکانی کوردو تورکمانو عەرەب لەم شارەدا لە سەر رۆشنایی بنەماکانی رابردوو هەڵدەچنرێت. ئەم رابردووەش تا ئەمڕۆ کەم باسو لێکۆڵینەوەی دروستی لە سەرە. بۆیە ئەمڕۆ هەمەجۆری کەرکوك لە بری ئەوەی، کە پێویستە ببێتە ئامرازێك بۆ یەکترقبوولکردنو خوێندنەوە، دەبێتە ئامرازێك بۆ شەڕو ناکۆکییو ناجێگیریی.

لەپێناو شکاندنی بەستەڵەکی ئەم قەناعەتە نادروستەی، کە ئەمڕۆ بووەتە پێشینەی شەڕو نائارامییو یەکتر نەخوێندنەوە، پێویستە سەرلەنوێ مێژووی پەیوەندیی گەلانی کەرکوك هەڵبوەشێتەوەو خوێندنەوەی نوێو دروستی بۆ بکرێت، هەر لایەنێك پێش گلەیی کردن لە بەرانبەرەکەی پێویستە بە خۆیدا بچێتەوەو رابردووی خۆی بخاتە ناو تەرازووی ویژدانییەوە، بە وانە وەرگرتن لە رابردوو هێڵەکانی پەیوەندی ئاراستەی ژیانی ئایندەی دیاری بکات.

*** بەشی دووەم: شوناسی کەرکوكو سیاسەتی تەتریك (بەتووركمانکردن):**

بە درێژایی مێژووی سیاسییو کۆمەڵایەتی کەرکوك، گەلانی ئەم شارە ئامرازێك بوونە بۆ شەڕی داگیرکەرانو دەسەڵاتە دیکتاتۆریو بیانییەکان، لە مێژووی کۆنیدا، کەرکوك چەندین دەورو زەمانی بە خۆیەوە بینیوە، زۆربەی هەرە زۆری مێژوونووسانو بیرمەندانی بواری جوگرافو شوێنەوار پێیان وایە شاری کەرکوك ئەمڕۆ هەمان شاری (ئەراپخا)ی کۆنە، هەر بۆیە شارەوانی کەرکوك ناوێکی مێژوویی گەرەکێکی نوێی کەرکوك، کە بۆ کارمەندانو فەرمانبەرانی کۆمپانیای نەوت دروستکرا بە ناوی (ارفا) واتە عەرەفەوە دیاریکرد[1].

بۆ زیاتر پاڵپشتی لەم راستییە هەمان ناوی (ئەراپخا) بۆ دیاریکردنی کەرکوك لە کتێبی (فاتحة انتشار المسیحیة في امبراطورية الايرين میسوپوتامیا وایران ١٠٠ – ٥٣٧)دا هاتووە، [2]، بەڵام مێژوونووسی بەناوبانگ تۆفیق وەهبی پێی وایە ناوی کەرکوك لە ووشەی (کەرەك) بە واتا قەڵا، یان قەلعەوە هاتووە[3].

لە فەرهەنگی (المدائن)ی عێراقیدا وا پێناسەی کەرکوك دەکات، کە قەڵایەکە لە سەر زەوییەکی بەرین دروستکراوەو هەموو شار دەکەوێتە ناو سنووری قەڵاکەوەو پاشاکانی شارەزووری تیادا نیشتەجێن[4].

ئەمانەو دەیان راستیی مێژوویی تر، کە کوردبوونی کەرکوك دەسەلمێنێت، هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە تا ئەمڕۆ، بەڵام هاوکات هەندێك نووسەری شۆڤێنی هەن دەیانەوێت راستییە مێژووییەکان بشێوێننو خەڵکی چەواشە بکەن.

(جەواد) لە سەر کەرکوك دەڵێت: ئەم ناوە لە بنەمادا لە ووشەی (کرك)ەوە هاتووە، ئەم ناوەش لە ئەسڵدا ناوی شاخێکی لوبنانییەو کرك ناوی قەڵایەکە لە سەر رێگای شام، هەروەها لە سەر ووشەی بابا گرگر دەڵێت: ئەم ووشەیە بە ئەسڵ تورکمانییە، برگەی یەکەم واتا ووشەی بابا بە واتای باوك دێتو ووشەی گرگر لە تورکیدا بە واتای رۆشنایی ئاگر دێت[5] ئەم لێکدانەوەیە لەگەڵ ئەوەی هەر بە تەماشاکردنی سەرپێیی بۆت دەردەکەوێت، کە لێکدانەوەیەکی زۆر نامەعقوولو ساویلکانەیە توانای قەناعەتکردنی کەسی نییە، چونکە نەك راستی مێژوویی، بگرە زمانیش دەشێوێنێت، کەسێك نییە نەزانێت، کە ووشەی باباگورگور ووشەیەکی کوردی پەتییە، هەر لە سەر ئەم ئاوازە لە سەردەمەکانی کۆندا پێش دۆزینەوەو دەرکەوتنی نەوت لەم ناوچەیەدا کورد ئەم ئاگرەی بە رووناکییەکی پیرۆز زانیوە، بۆیە ژنانی کورد بۆ داواکردنی منداڵ دەچوونە سەری، هەر لە دوورەوە بە گۆرانی دەیانووت: باباگورگور بە گور هاتین، بۆ کور هاتین. هاوکات بە تێرامان لە نووسەرانی ئەم فەرهەنگەش زیاتر ئەو راستییە روون دەبێتەوە، کە مەبەست لە تێکدانی چییە، هەر سێ نووسەر (سەلیم موتەر، عەلی توینی، نەسرت مەردان) لە

ناو نەك تەنها بیرمەندانی کورددا، بەڵکو لە نێوەندە عێراقیی و عەرەبییەکانیشدا بە کەسانی شۆڤێنیی و باوەڕپێنەکراو ناسراون و بەردەوام هەوڵی شێواندنی ڕاستییەکان دەدەن.

ئەمڕۆ کاڵفامیی هەندێك نووسەری شۆڤێنی لەوەدایە، کە دەیانەوێت زۆر بە ئاسانی عەقڵی سووك گێلی و نەشارەزایی و بەزۆرە ملێ ڕاستی و مێژووی کۆنی دەیان ساڵە بشێوێنن و هەموو ئەو بەڵگەنامە مێژوویی و زانستییانە وون بکەن، کە دەیسەلمێنێت کەرکوك لە ماوەی سەدەکانی دواییدا بەشێك بووە لە ئیمارەتی ئەردەڵانی کوردی. ئەو کات سوڵتان مورادی سێیەم ئەمیری موکریان لە ساڵی (١٨٥٣)دا داوا دەکات بە ئیدارەدانی (ئەیالەتی) شارەزوور، کە ئەو کات کەرکوك ناوەندی ئەو (ئەیالەتە) بووە، لە کۆتایی سەدەی حەڤدە کەرکوك دەچێتە سنووری موڵکەکانی ئیماراتی بابانەوەو جێگای ئیمارەتی ئەردەڵان دەگرێتەوە.

لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی دوا ئیمارەتی کوردی (ئیمارەتی بابانی) لە ساڵی (١٨٥١)دا لە ئاکامی سیاسەتی نوێی (الباب العالي) لە کوردستان، کە مەبەست لێی دوورخستنەوەی کارو بڕیارەکان بوو لە دەسەڵاتی سەرکردە ناوچەییەکان، کە بە گشتی کوردبوون، هاوکات بڕیاردەدات بە ڕاگەیاندنی پاشکۆیایەتی (تەبەعییەت) بۆ سوڵتان، بەمەش دەبێت لە گوتارەکانی هەینیدا باس و وەسفی سوڵتان بکرێت و هاوکات سەرباز بنێرن بۆ شەڕ، ئەمە جگە لە ناردنی دیاری و پارەی ساڵانە بۆ تەختی دەسەڵاتی عوسمانی.

بە دارمانی ئیمارەتی بابانی دەرگای داگیرکردن ڕاستەوخۆ بۆ عوسمانییەکان دەکەوێتە سەر پشت و ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر خۆیان لەم ناوچەیەدا دەسەپێنن و لایەنگرو مورید بۆ خۆیان پەیدادەکەن. بە تایبەتی کەسانی ئاغاو دەرەبەگو شێخیان بە ناوی ئایینەوە ڕادەکێشاو لە بەرانبەریشدا لە تەنیشت پاڵپشتیکردن لێیان پارەو زەویی جوتیارانیان پێدەبەخشین.

کەرکوك لە سەردەمەکانی ئەمەوی و عەباسی و ئەیوبیدا بە ناوی ئیسلامکردنەوە شاڵاوی بە عەرەبکردنی بە سەردا سەپێندراوە، لە ماوەی سەدەی چواردەدا چەند عەشیرەتێکی تورکمانی بەمەبەستی دابینکردنی بژێوی ژیان هاتوونەتە کەرکوك، دواتر لە سەدەی شازدەدا کەرکوك، کە پێکهاتەی ئیداریی و ئابووری هەرێمی شارەزوور بوو بەسترایەوە بە دەوڵەتی عوسمانییەوەو بە پێی ڕێککەوتننامەیەك لەگەڵ ئێراندا سنوورەکانی بۆ دیاریکرا.

عوسمانییەکان بە هاتنە سەر حوکمیان و دەسەڵات گرتنە دەستی ئەم ناوچەیە بە حوکمی زمان و کولتووری هاوبەش لە تورکمانەکان نزیکبوونەوەو تورکمان بوون بە حاکمی ئەم شارەو بەشێکی گرنگی دارودەستەی دەسەڵاتی عوسمانییان پێکهێنا، لەو کاتەوە سیاسەتی تەتریکیان دەستپێکردو کەوتنە نزیکبوونەوە لەو کەسانەی کە ناسنامەی خۆیان دەگۆڕی و زمانی تورکمانییان دەزانی، ئەمە جگە لەوەی شاڵاوێکی دەرکردنی کوردییان لەم شارەدا بەرپاکرد، عوسمانییەکان کەوتنە لێدان و ئازاردانی عەشیرەتە کوردەکان، لەوانە عەشیرەتی شێخ بزێنی لە ناوچەی شوان، کە دەکەوێتە باکووری شاری کەرکوکەوەو بە تەواوەتی ڕاگواسترانەوە بۆ ناوچەی قونییە لە باشووری ئەنکەرەو ناوەڕاستی ئەنادۆڵ، ئەم عەشیرەتە تا ئێستاش بە زاراوەی کوردی ناوچەی کەرکوك قسەدەکەن، هەروەها کەوتنە ڕاگواستنی بە هەزاران کەس لە عەشیرەتی هەمەوەند بۆ ناوچەکانی ماردین و ئورفە لە ناوەندی ئەنادۆڵ، هەندێکیشیان گواسترانەوە بۆ وڵاتانی لیبیاو جەزائیر[٦].

بە زیاتر کۆنترۆڵکردنی کوردستان و کەرکوك لەلایەن عوسمانییەکانەوە سیاسەتی تەتریك و ڕاگواستن و ئازاردانی کوردانیش زیاتر دەبوو، بۆیە هەندێك لە شێخ و پیاوە ئایینییەکان و کورد پەروەرەکانی ئەو سەردەمە ڕووبەڕووی ئەم سیاسەتە بوونەوەو هەوڵی دامەزراندنی ناوکی یەکەم بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کوردیاندا، لەم بازنەیەدا شێخ ئەحمەدی بارزانی بە یەکێك لە پێشەواکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کورد لە عێراق دادەنرێت.

لە ساڵی (١٩٠٧) بۆ یەکەمجار بە شێوەیەکی ڕێکخراوو دیار شێخ ئەحمەد کۆمەڵێك داواکاریی سەبارەت بە ژیانی گەلی کوردو مافەکانی خستە بەردەم دەسەڵاتی عوسمانی، بەڵام عوسمانییەکان لە بری ئەوەی بیر لە چارەسەری کێشەی کورد بکەنەوەو بە شێوەیەکی مرۆڤایەتی و عادیلانە وەڵامی کورد بدەنەوە، بە پێچەوانەوە کەوتنە دانانی بەرنامە بۆ لێدانی کوردو بزاوتە سیاسییەکەی و شاڵاوێکیان بۆ سەرکوتکردنی شێخ ئەحمەد بارزانی دەستپێکرد. دوای بەندکردنی ڕەوانەی بەندیخانەی بەدلیس لە کوردستانی باکوور کراو هەر لەوێدا مایەوە تا مردنی، لە دوای ئەمیش شێخ عەبدولسەلام کوڕە گەورەی شێخ ئەحمەد کەوتە خۆی بۆ سەر لە نوێ ڕێکخستنەوەی بزووتنەوەی کوردایەتی، لەم بازنەیەشدا پەیوەندیی لەگەڵ چەندین ڕێکخراودا دروستکرد لەوانە جمعییەتی تەعالی و تەرەققی کورد هەروەها لەو کەسایەتییانەی، کە شێخ سەلام پەیوەندی پێیانەوە کرد شێخ مەحمودی نەمرو شێخ عەبدولقادری نەهری و (ئیسماعیل ئاغا) سمکۆی شکاك بوون.

لە دوای ئەم هەنگاوانە شێخ سەلام بە شێوەیەکی ووردتر لە ڕاپۆرتەکەیدا بۆ حکومەتی عوسمانی، کە چەندین داواکاریی پەیوەست بە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردی لە خۆگرتبوو خستەڕوو، لەوانە:

١. دانانی زمانی کوردی بە زمانێکی ڕەسمی لە کوردستان.

٢. کردنی خوێندن بە زمانی کوردی و کردنەوەی قوتابخانەی پێویست.

٣. دامەزراندنی کەسانی ئیداریی لە ناوچە کوردییەکان لە فەرمانبەرانی کورد.

بە هەمان شێوەی پێشوو وەڵامدانەوەی عوسمانییەکان بۆ ئەم داواکارییە سەرەتاییانەش هەمان بەرگی پێشووی لەبەرکردو ڕاستەوخۆ جەنەراڵەکانی تورك کەوتنە خۆئامادەکردن بۆ لێدانی شێخ عەبدولسەلام و هاوڕێکانی و سوپای عوسمانی هێرشێکی توندیان کردە سەر ناوچەی بەرزان و کەوتنە دارمان و سووتانی ناوچەکەو کوشتن و

راگواستنی خەڵکەکەی‌و توانیان شێخ عەبدولسەلام‌و خێزانەکەی‌و منداڵێکی سێ ساڵانی (مەلا مستەفا) رەوانەی بەندیخانەی موسڵ بکەن، دواتر لە ساڵی (١٩١٥)دا لەلایەن دەسەڵاتی عوسمانییەوە شێخ سەلام لە سێدارە درا.

عوسمانییەکان بەم دەرکردن‌و بەتاڵانبردنەی ماڵی کوردان‌و کوشتوبڕینەشەوە نەوەستان، شاڵاوی تەتریکیان بۆ کەرکوك‌و ناوچە کوردنشینەکان زۆر بە فراوانی دەستپێکرد. لە کتێبی (المسالك والممالك)دا ئیبن خردبە دەڵێت: والی خۆراسان (عەبدوڵڵای کوڕی تاهیر) ساڵانە دوو هەزار تورکی لە سەرجەم شارەکانی تورکستانەوە رەوانەی عێراق دەکرد، ئەمەش بە پێی فەرمانێك بوو لە خەلیفەوە دەردەچوو[٧].

ئەم تورکمانانە بەشێکی زۆریان دەهاتنە ناوچەی کەرکوك. لە لایەك بەمەبەستی کارکردن لەو شارەو لە لایەکی تر سیاسەتی عوسمانییەکان وای دەویست، کە تورکمانەکان لە ناوچەکانی کەرکوك‌و دەورووبەری جێگیر بکات، ئەمەش نەك بە تەنیا لەبەر ئەوەی سیمای دۆزینەوەی نەوت لەم شارەدا بەدەرکەوت، بەڵکو بەمەبەستی کۆنترۆڵکردن‌و پاراستنی ئەو رێگا بازرگانییەی کە لە ئەنادۆڵەوە بۆ ناوەراستی عێراق بە کەرکوکدا شۆڕ دەبووەوە. عوسمانییەکان بە تەواوی شوێن پێی خۆیان لە کەرکوك گیردەکرد، بە تایبەتی دوای ئەوەی هێزێکی سەربازییان لە کەرکوك جێگیرکرد. بەمەبەستی لێدانی دوژمنانی دەوڵەتی عوسمانی‌و عەشیرەتە کوردەکان ئەوانەی لە دەسەڵاتی تورك یاخی دەبوون‌و نارازیبوون. عوسمانییەکان لە کەرکوکدا باوەشیان بۆ هەموو ئەو کوردو عەرەبانەش دەکردەوە، کە ناسنامەی خۆیان دەگۆڕی بۆ تورکمان‌و هاوشانی ئەمەش تورکمانەکان پلەو پایەو دەسەڵات‌و پارمەتی دارایی زۆریان وەردەگرت، لە هەردوو بواری مەدەنی‌و سەربازیدا، چەندین دەرەبەگو ئورستکراتیان لێ دروستکردن.

بۆ زیاتر سەپاندنی پلان‌و سیاسەتەکانیان، عوسمانییەکان چەندین قوتابخانەیان لەم شارەدا بە زمانی تورکی کردەوە، تا ئەو ئاستەی خوێندن بە شێوەیەکی گشتی لە کەرکوکدا بوو بە زمانی تورکمانی. عوسمانییەکان لە سەرەتای دەسەڵاتییانەوە کەرکوکیان کردە پێگەیەکی خۆیان بۆ ئامادەکردنی فەرمانبەرو کادری تورکمانی. بەم مەبەستەش چەندین قوتابخانەیان بە زمانی تورکی لەم شارەدا کردەوە، لەوانە:

١. قوتابخانەی شاغازی لە قەڵا.

٢. قوتابخانەی ئەلسەرا، موتەسەریفییەتی کەرکوك لە ساڵی (١٠٤٩)ی کۆچی لە گەرەکی خانەقا دایانمەزراند.

٣. قوتابخانەی ئەلئەیوبییەی ئەحمەد پاشا، کە موتەسەریف ئەحمەد پاشای ئەیوبی زادە لە ساڵی (١٧١٥)ی زایینی دایمەزراند.

٤. قوتابخانەی ئەلقوتیە، ساڵی (١٧٥٩) زایینی.

٥. قوتابخانەی پیشەسازی (الصناعة) ساڵی (١٨١٩) زایینی.

٦. قوتابخانەی ئەلحاج ئەحمەد ساڵی (١٨٨٤) زایینی.

٧. قوتابخانەی ئەلمەیدان.

٨. قوتابخانەی سەرەتایی ئەلرەشیدیە، (١٨٦٨) ساڵی (زایینی).

٩ – قوتابخانەی ئیبراهیم پاشا، ساڵی (١٨١٩) زایینی.

ئەم سیاسەتەی عوسمانییەکان تا دەرکردنیان لە عێراق بەردەوام بوو، وڵاتە هاوپەیمانەکان دوای سەرکەوتنیان لە شەڕی جیهانی یەکەم کەوتنە دابەشکردنی میراتی پیاوە نەخۆشەکە (ئیمپراتۆریەتی عوسمانی) لەنێوان خۆیاندا.

لە (٧)ی نیسانی ساڵی (١٩١٨)دا ئینگلیز توانی شاری کەرکوك داگیربکات، بەڵام لە (٢٤)ی مانگی حەوتدا کشایەوەو جارێکی تر لە (٢٨)ی ئابی هەمان ساڵدا. واتا چەند رۆژێك پێش مۆرکردنی رێکەوتننامەکەی نێوان هاوپەیمانان‌و دەوڵەتی عوسمانیدا، دەستی گرتەوە بە سەر کەرکوکدا.

لە (٣٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٨) سنووری ناوچەی کەرکوك لەنێوان زێی بچووك تا رووباری دیالە لە باشوورو لە باکووری رۆژهەڵاتەوە تا سنووری ئێران‌و تورکیا دیاریکرا. بە ئاشکرابوونی نەوت لە کەرکوك بەو شێوە زۆرەی، کە هەیەتی‌و هاوکات دەرکەوتنی گرنگی نەوت لای بەریتانییەکان‌و بریاردانی بە گۆڕینی ووزەی سەرجەم ئامێرەکانیان لە خەلوزەوە بۆ نەوت، وای لەئینگلیزەکان کرد، کە سیاسەتێکی تریان هەبێت بۆ کەرکوك‌و ناوچەکانی تری ژێر دەسەڵاتی خۆیان، ئەوان دەیانویست سەرجەم ناوچە بە پیتەکانی خۆیان بە یەکەوە ببەستنەوە، وەك عێراقیش بێ گوێدانە جیاوازی نەتەوایەتی نێوان کوردو عەرەب، کوردستانیان خستە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندییەوە.

کوردەکان ئەو کات لەگەڵ ئەوەی دژی هاتنی سوپای ئینگلیز بوون، بەڵام بێزاریی‌و زوڵمی دەسەڵاتی عوسمانی وای کردبوو پێشوازییەکی گەرم لە سوپای ئینگلیزەکان بکەن. سەرەتای سیاسەتەکانی ئینگلیز لە کەرکوکدا وای کرد کوردەکان دژی گەرانەوەی تورکمانە هەڵاتووەکان بوەستنەوە، چونکە عوسمانییەکان لە تۆڵەی ئەو بارەی بە سەریدا هاتبوو لە کاتی کشانەوەیدا لە کوردستان کەوتنە وێرانکردنی ماڵ‌و کشتوکاڵی گوندنشینەکان‌و بە تاڵانبردنی ئەوەی بەردەستیان بکەوتایە لە ئاژەڵ‌و پارەو پووڵ‌و کەرەستە.

لەم بارەیەوە، دادوەری مەدەنی گشتی بەریتانی لە عێراق لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٨)دا نووسیویەتی: بارودۆخەکە لایەنێکی زۆرخراپی لە خۆگرت بە هۆی ئەو کردەوانەی سوپای تورك، کە لەکاتی کشانەوەیاندا بەمەبەستی تۆڵەکردنەوە لە کورد بە هۆی مەوقیفیان لە عوسمانی‌و پاڵپشتیکردنیان لە ئینگلیز کردبوویان. تورکەکان ئەو کات سیاسەتێکیان بەرپا دەکرد بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان، بەردەوام لە هەوڵی نانەوەی ناکۆکیی‌و شەڕو پشێویدا بوون لەنێوان ئەو گەلانەی دەکەوتنە ژێر دەسەڵاتییانەوە، ئەوان رۆڵێکی مەزنیان بینی تا توانییان ناحەزیی‌و ناکۆکیی بخەنە نێوان کوردو ئەرمەنەوە، ئەمەش بەمەبەستی دارمانی ئەرمەن‌و مەحرومکردنی کورد لە دەستخستنی مافە نەتەوایەتییەکانی‌و لەدەستدانی هەلێکی لەبار بۆ وەرگرتنی مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد[٨].

*** بەشی سێیەم: کوردو تورکمان لە سەردەمی پادشایەتیدا:**

تورکمانەکان لە پاش دەسەڵاتی عوسمانی دژی دۆخی سیاسیی تازە بوون، ئەوان دەیانویست بورهانەدینی کوڕی سوڵتان عەبدولحەمید بکرێتە پادشای عێراق، بەڵام ئەو هەوڵو داوایەی ئەوان لەلایەن ئینگلیزو هاوپەیمانانەوە نەك هەر ڕەزامەندی لە سەر نەدرا، بەڵکو بە داوایەکی زۆر نامەعقولیشیان دەزانی، بۆیە تورکمانەکان دەنگیان بە کاندیدەکەی ئینگلیز فەیسەڵی کوڕی شەریف نەدا. کوردەکان لەم بارودۆخەدا بوون بە دوو بەشەوە، هەندێکیان پێیانوابوو دەبێت هەوڵی سیاسییو گوشاری مەدەنی بخرێتە سەر ئینگلیزو دەسەڵاتی نوێی عێراق بۆ وەرگرتنی مافەکانی کورد، هەندێکی تر پێیان وابوو ئینگلیز لە بەرانبەر کورددا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ عوسمانییەکاندا نییە، بۆیە دەبێت کورد خەباتی چەکدارییو شەڕی ڕزگاری خۆی دەست پێبکات.

لەو کاتەوە تورکمانەکان هیچ سەنگێکی سیاسییان نەما تەنها لە پاشکۆی گەلی عەرەبی عێراقدا دەیانویست ڕۆڵی خۆیان ببینن، بەڵام گەلی عەرەبو دەسەڵاتی عێراق هیچ سەنگێکیان بۆ تورکمانەکان دانەدەنا، چ بەهۆی ئەو ڕۆڵەی، کە لە سەردەمی عوسمانیدا دەیانبینی بۆ دژایەتیکردنی دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی عێراقو وەستانەوە لە دژی مەلیك فەیسەڵ، چ وەك ئەوەی ژمارەی تورکمانەکان بە بەراورد بە عێراق، کە ٢٪ی عێراقییەکان زیاتر پێکناهێنن عەرەب هیچ سەنگێکی بۆیان دا نەدەنا. لە لایەکی ترەوە لە سەردەمی دامەزراندنی حکومەتی نوێی عێراق بە فیتو پاڵپشتی دەسەڵاتی عوسمانی هەوڵیاندا بۆ گەڕانەوەی ویلایەتی موسڵ بۆ ژێر دەسەڵاتی عوسمانی، بۆیە هەر ئەو کات کەوتنە تەزویرکردنو فرتو فێڵ بۆ شێواندنی دیمۆگرافیای ناوچەکەو بەردەوام ژمارەی دانیشتووانی کوردیان کەم دەکردەوەو لە بەرانبەر زیادکردنی ژمارەی خۆیان، تورکمانەکانی عێراق نەیانتوانی ئەم داوایەشیان بەدەستبهێنن، چونکە ئەوان ئەو کاتو تا ئەمرۆش لەو خەیاڵەدا دەژین پێیان وایە گۆڕینی ناسنامەی شارێك، کە بەشی هەرە زۆری کوردە، بە ئاسانی دەگۆڕدرێتو تەزویردەکرێت، ئەمە ڕاستییەکی تاڵە، بەڵام ئەوان مەنتیقی بیرکردنەوەیان بە شێوەیەکی ترەو جیاوازو دوور لە عەقڵی هاوچەرخە.

ئەم عەقڵییەتە بە گشتی زەرەرو زیانێکی زۆری لە بەرژەوەندیی نەتەوایەتیو سیاسییو ئابووریی تورکمان لە عێراق داوە، بۆیە تا دارمانی ڕژێمی پادشایەتی لە عێراقدا ئەمان نەیانتوانی هیچ سەنگێکی سیاسییو هیچ پێگەیەکیان هەبێت لە هاوکێشەی سیاسیی عێراقدا. لە ساڵی ١٩٢٦دا بە بڕیارێکی (کۆمەڵەی گەلان – عصبة الأمم) ویلایەتی موسڵ خرایە سەر عێراق، ئەمەش دوا بزمار بوو درا لەتابووتی ویستەکانی تورکمان لە عێراقو تورکەکان بە تەواوەتی نائومێد بوون. بۆیە لێرەوە تا ڕووخانی ڕژێمی پادشایەتی تورکمانەکان نەیانتوانی لە گۆڕەپانی سیاسیی عێراقو کەرکوکدا هیچ ڕۆڵو گوشارێکیان هەبێت.

ئینگلیزەکان لە سەردەمی شەڕی جیهانی یەکەمدا زۆر بە وریاییەوە توانیان دەسەڵاتی خۆیان لە ناوچە بەپیتەکانی ڕۆژهەڵاتدا بچەسپێنن. لە ڕێککەوتننامە نهێنییەکەی سایکس – بیکۆدا لە ساڵی (١٩١٦)، کە لەنێوان هاوپەیمانانی شەڕی جیهانی یەکەمدا بەسترا، کەرکوك لە بەشی فەرەنسادا بوو، بەڵام دوای دۆزینەوەی نەوتو ئاشکرا بوونی بەو زۆرییەی کە هەیەتی. ئینگلیزەکان توانیان ویلایەتی موسڵ لە فەرەنسا وەرگرنەوە لە بەرانبەر پێدانی هەندێك ئیمتیازاتی نەوتیدا.

لەم ڕێکەوتنەدا عوسمانییەکان دانیان بە جیاکردنەوەی باشووری کوردستان لە دەوڵەتی عوسمانی نەنا بەو بیانووەی، کە بەشێکی ئەم ناوچەیە لە دوای مۆرکردنی ئاگربەست نێوانیانەوە داگیرکراوە، ئەمە خەیاڵێکی مردووی دەوڵەتی عوسمانییە تا ئەمرۆش بە تەواوەتی دەستبەرداری نەبووە.

*** بەشی چوارەم: سەرهەڵدانی کێشەی ویلایەتی موسڵو دەستپێکردنی قۆناغی یەکەمی سیاسەتی تەعریب:**

لە سەردەمی سەرهەڵدانی کێشەی ویلایەتی موسڵدا، لایەنە ناکۆکەکانی گۆڕەپانی سیاسیی ئەو کاتەی ناوچەکە، هەریەکە کەوتنە خۆیان بە پێشکەشکردنی بەڵگەنامەی موڵکایەتی بۆ سەلماندنی دورستی مافی خۆی لەم وڵاتە. پێکهاتەی دیمۆگرافی ویلایەتی موسڵیش، کە پێکهاتووە لە کوردو تورکمانو عەرەبو ئاشووری کەوتنە ناو بازنەی ویستەکانی ئەو وڵاتانەوە، هەر لایەنێك لەمانە ژمارەی دانیشتووانو دابەشبوونی لەنێوان نەتەوەو ئاینەکان بە شێوەیەك دەخستەڕوو، کە لە بەرژەوەندیی خۆیدا بێت. ئینگلیزەکان ڕاپۆرتی خۆیان بەو شێوەیە دایە لیژنەی عوسبەی ئومەم، کە ژمارەی دانیشتووانی کەرکوك بە پێی دابەشبوونی نەتەوایەتیو ئاینی لە دوای شەڕی جیهانی یەکەم بەم شێوەیە بوو: کورد چلو پێنج هەزار کەس، تورك سیو پێنج هەزار کەس، عەرەب دە هەزار کەسو مەسیحیی شەش سەد کەسو جولەکە هەزارو چوار سەد کەس، بەمەش ژمارەی لیوای کەرکوك دەکاتە نەوەدو دوو هەزار کەس، بەڵام لایەنی تورکی ژمارەی دانیشتووانی بە دوو ئەوەندە خستەڕوو، کە دابەشکرابوون بە نەوەدو حەوت هەزار کەس کوردو حەفتاو نۆ هەزار تورکمانو هەشت هەزار عەرەب، ژمارەی گشتیش سەدو هەشتاو چوار هەزار کەس[٩].

ئەو کات تورکمانەکان لە پاڵ ئەم تەزویرکردنەش بانگەشەی ئەوەیان دەکرد، کە کوردەکان زیاتر لە تورکەوە نزیکنو دەبێت بە تورکمان هەژمار بکرێن، گەلی کورد لە نێو ئەم دوو ئیمپراتۆرییەتەدا لە دوو لاوە زوڵمی لێدەکرا، لە لایەك تورکمانەکان، وەك ئەوەی لە پاشماوەی دەسەڵاتی عوسمانییەوە بۆیان مابووەوە، کە زۆربەی هەرە زۆری فەرمانبەرانی کەرکوك تورکمان بوون، لە ڕاپرسییەکاندا غەدریان لە کورد دەکردو چەندین خێزانی کوردیان بە تورکمان ناونووس دەکرد، هاوکات لە ڕاپرسییەکەدا دەسەڵاتی عەرەبی لەبەر ئەوەی کۆتایی ژمارەکان لە لای ئەوان کۆدەبووەوەو ئەوانیش بە لای بەرژەوەندیی عەرەبدا

## یادی یەك ساڵەی
## شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨
## لەلایەن تورکمانەوە



ژمارەی دانیشتووانی کوردی کەرکوکیان کەم دەکردەوە لە بەرانبەر زیادکردنی عەرەب لەم شارە.

یەکێك لە گرفتە سەرەکییەکانی ئەم شارە، ئەوەیە، کە بەردەوام ئەم باجی ناکۆکیو نارێکی وڵاتانی دەوروبەری عێراق دەدات بە تایبەتی تورکیاو وڵاتە عەرەبییە شۆڤێنیو توندرەوەکان.

ئەو کات کورد لەم شارەدا بێدەسەڵاترینو بێ زمانترین بوونەوەر بوو، نەك وڵاتانی نزیكو هاوسێ، بگرە وڵاتە مەزنەکانو وڵاتانی سەرمایەداریو داگیرکەرانو وڵاتانی کۆمەنیستی، کە وایان رادەگەیاند پشتو پەنای بێکەسو بێدەرەتانەکانن، کەسێکیان قسەیەکی خێریان بۆ کورد نەدەکرد، هەموو بە دەستێك چمکێکی کەوڵی کوردیان گرتبووو بە دەستەکەی تر سەواو رێکەوتنیان لە سەردەکرد.

لە (٢٠)ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٣٠)دا شارەوانی کەرکوك هەستا بە ئامارکردنی سنووری شارەوانی کەرکوكو ژمارەی دانیشتووانی ئەم شارەی بە سیو پێنج هەزار کەس دیاریکرد، لەمە دوازدە هەزار کەسیان کورد بوو، حەوت هەزار تورکمان، دوو هەزار مەسیحیی، دوو هەزار تەیاریین، پێنج سەد ئەرمەنیو دوو هەزارو پێنج سەد جولەکە، لەگەڵ چەند نەتەوەو ئایینێکی تر بە ژمارەو قەبارەی کەمتر.

رێژەی دانیشتووانی لیواکەی لە سەر بنەمای نەتەوایەتی بەم شێوەیە خستەروو: (٥١٪) کوردو (٢١,٥٪) تورکمانو (٢٠٪) عەرەبو (٧,٥٪) نەتەوەکانی تر.

لەم سەردەمەدا ئەوەی پاڵپشتی لە کورد دەکرد، هیچ لایەنێك نەبوو، بەڵام زۆری ژمارەی کورد خۆی خۆی دەسەپاند بۆیە نەدەلوا دوژمنانی لەوە زیاتر ژمارەیان کەم بکەنەوە، یان نکووڵی لە بوونیان بکەن.

نەتەوەکانی کەرکوك لە کوردو عەرەبو تورکمان رۆژانە لەم شارەدا رووبەرووی یەك دەبوونەوە، ناکۆکیو بەرژەوەندیی لایەنە تورکمانەکان بە رێنماییو تەعلیماتو یارمەتی دەوڵەتی تورکی سنگی خۆیان دەرپەراندو دژایەتی ئەوانی تریان دەکرد، عەرەبەکانیش بە پاڵپشتی عێراقو وڵاتانی تری عەرەبی بەزۆر بوونی خۆیان وەك خاوەنی تەنیای شار دەسەپاند، کورد هیچ پشتو پەنایەکی نەبوو. وەك خۆشی لەناو بیری ئایدیۆلۆژیدا توانا هێزی لاوازی خۆیەتیشی خنکاندبوو بۆ بەرژەوەندیی سۆڤێتو بیری مارکسیزم نەك کورد، لەم دۆخەدا زۆرجار عەرەبەکانو تورکمانەکانیش رووبەرووی یەك دەبوونەوە، عەرەبەکان دەیانووت تورکمان لە کەرکوکدا نییە. ئەوانە هەندێك خەڵکی کۆچەرن هاتوونەو هیچ مافێکیان بە عێراقەوە نییە، تورکمانەکانیش عەرەبیان لەم شارەدا بە میوان لە قەڵەم دەدا، سەرچاوە تورکمانییەکان بەم شێوەیە باس لە نیشتەجێکردنی عەرەب لە کەرکوك دەکەن:

*** عەرەب لە رێگای هێنانی چەند عەشیرەتێکەوە هاتوونەتە کەرکوك بەم شێوەیەی لای خوارەوە:**

**یەکەم: عەشیرەتی عوبێد:**

بە دوو قۆناغ هاتوونەتە کەرکوك:

أ. قۆناغی یەکەم: لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەیەم لە ئاکامی دروستبوونی شەرو ناکۆکی لەنێوان عوبێدو عەشیرەتی شەمەر لە ناوچەی زوممار، عوبێدییەکان لە دەست زوڵمو شەری شەمەر هەڵهاتنو هاتنە ناوچەی حەمرینو نیشتەجێ بوون. دواتر بەشێکی زۆریان بە دوای نانو کەسابەتیدا شۆربوونەوە بۆناو کەرکوك لەگەڵ کوردەکاندا تێکەڵبوون. شایانی باسە ئەم عەرەبانە بە نیگەرانکردنی سۆزو رەوشتی کورد کە لە خوورەوشتیدا رێزگرتنو یارمەتیدانی میوان بە ئەرکی سەر شانی خۆی دەزانێت، توانیان ببن بە هاووڵاتی ئەم شارە.

ب. قۆناغی دووەم: کۆچی عوبێد بۆ رۆژهەڵاتی حەمرین لە ساڵی (١٩٣٦)، بە فەرمانی سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتەی عێراق یاسین هاشمی، کە پیاوێکی شۆڤێنی عەرەبی بوو، هەر ئەو کات سەرەتای بنەمای سیاسەتی تەعریبو گۆرینی ناسنامەی کوردی دارشت. بە دەرکەوتنی گرنگی کەرکوك عەرەبە شۆڤێنییەکان کەوتنە کار بۆ دەرپەراندنی کورد لە کەرکوك، سەرەتا سەرانی سیاسی عێراق بیریان لە تەعریبکردنی دەوروبەری کەرکوك کردەوەو پلانەکانیان بۆ نیشتەجێکردنی عەرەب لە ناوچەکانی حەمرینو حەویجەوە دەستپێکرد.

**دووەم: جبور:**

لە ساڵی (١٩٣٦)دا بە پاڵپشتو هاندانی وەزارەتەکەی یاسین هاشمی عەشیرەتی جبور وەك سیاسەتێکی تەعریب هێنرانە بەری رۆژهەڵاتی رووباری زێی بچووكو ناوچەی حەویجە، ئەمەش لە رێگای پێدانی چەندین دەستکەوتی جۆراو جۆر لە ناوچەی کەرکوكو ئاسانکاریو هاوکاری تەواوکران تا بە تەواوەتی جێگیرکران.

**سێیەم: حەمدانییەکان:**

ئەم عەشیرەتە لە ساڵی (١٩٥٠)دا لە ناوچەی دووبزو دەوروبەری جێگیرکرانو بەمەبەستی هاندانو یارمتیدانیان لەلایەن حکومەتی ناوەندییەوە مۆڵەتیان بۆ وەرگیرا لە کۆمپانیای نەوتی بیانی لە دووبزو بای حەسەن کاربکەنو دواتریش لەوێ نیشتەجێکران.

**چوارەم: نعێم:**

لە رۆژانی کۆتایی سوڵتان عەبدولحەمید چەندین خێزانیان لە گەرەکە جۆراوجۆرەکانی کەرکوك بە هۆکاری ئاینییەوە نیشتەجێ کران، ئەم عەشیرەتە ساداتنو بە زۆری تەکێو بارەگای ئاینییان لە کەرکوك کردەوە، سەییدەکانی نعێم زیاتر لەوانی تر توانیان تێکەڵ بە کورد ببن، چونکە

ئەمانە بە زۆری پیاوی ئایینی بوون، لەرێگای ئایینەوە توانیویانە دزە بکەنە ناو عەقڵی کوردەوە، ئەمە راستییەکی دڵتەزێنە، کە بە درێژایی مێژووی سیاسی ئایین وەك چەکێکی زبرو کاریگەر بۆ لێدانی کورد بەکارهاتووە.

**پێنجەم: حدیدییەکان:**

ئەم بنەماڵەیە پێنج خێزان بوون لە ساڵی (١٩١٥)دا هاتنە کەرکوکو لە ناوچەی پیشەسازی ئێستادا نیشتەجێبوون، بە دوای پەیداکردنی بژێوی ژیاندا هاتوون و کەس نەیانی هێناوە.[١٠] ئەم بنەماڵەیە ئێستا بە سەدان خێزانیان لێکەوتۆتەوەو خۆیان بە خەڵکی رەسەنی ئەم شارە دەزانن.

**بەشی پێنجەم: بزووتنەوەی رزگاریخوازیی کورد، لە سەردەمی دەسەڵاتی ئینگلیزو پادشایەتیدا:**

بە بێبەشکردنی کورد لەم سەردەمەدا دووبارە بزووتنەوەی رزگاریخوزای کورد دەستیپێکردەوە. شێخ ئەحمەدی کورە گەورەی شێخ سەلام بوو بە رابەری هێزە بەرهەڵستکارەکانی کوردو بە سەدان لاوی کورد روویان کردە ناوچە سەختو شاخاوییەکان.

سوپای ئینگلیز بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی ناوچەکەو دامەزراندنی بنکەی پۆلیس و بارەگای سەربازی، هێزێکی سەربازی گەورەیان رەوانەی ناوچەی بارزان کرد. ئەمە بووە هۆی دروستبوونی شەرو پێکدادانی توند لەنێوان لایەنگرانی شێخ ئەحمەدو هێزەکانی عێراق.

لە (٩)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٣٠)دا پشکۆی شۆرش گڕی گرتو هێزە کوردییەکان توانیان زیاتر لە پەنجا سەربازی حکومەت بکوژن و لە ناوچەکە وەدەریان بنێن، بەمەش بزووتنەوەی رزگاریخوازیی کورد توانی بچێتە قۆناغێکی پێشکەوتووترەوە، رۆژ بە رۆژ لایەنگرانی شۆرشی رزگاری کورد زیاتر لە فراوانبوون و بەهێزبووندا بوو. لە ئاکامی ئەم رووداوە حکومەت بە هاوکاری سوپای ئینگلیز بریاریدا بە بەرپاکردنی هێرشێکی سەربازیی گەورە بۆ لەناودانی شێخ ئەحمەدو هاوەڵەکانی، لە مانگی نیسانی ساڵی (١٩٣٠)دا بە پاڵپشتی هێزە ئاسمانییەکانی بەریتانیا هێرشێکی بەربڵاویان کردە سەر چەکدارە یاخیبووەکانی کورد.

لەو ماوەیەدا حکومەتی تورکی پاڵپشتی هێزەکانی مەلا ئەحمەدو بەرهەڵستکارانی کوردیان دەکرد بۆ لێدانی ئینگلیز، لە (٢٢)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٣١)دا شێخ ئەحمەد ناچارکرا بە هەڵهاتن بۆ تورکیاو تەسلیمبوون بە دەسەڵاتی تورکی. ئەو کات دەسەڵاتی تورك مەلا ئەحمەدو هاورێکانیان گواستەوە بۆ ناوچەی ئەدرنە لە سنووری بولگاریا، بەڵام ئەوەندەی پێنەچوو هێنایانەوە بۆ ناوچە سنوورییەکانی عێراق.

لە (٣٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٣٥)دا حکومەتی تورکی بە رێککەوتننامەیەك سنوورەکانی خۆی لە بەردەم بەرهەڵستکارانی کورددا داخستو سوپایەکی زۆری لە سنوورەکانی عێراق حەشاردا بۆ یارمەتیدانی حکومەتی عێراقی بەمەبەستی شکستهێنان بەو بزووتنەوەیەی کورد.

لە ئابی ساڵی (١٩٤٥)دا جارێکی تر شۆرشی کورد لە ناوچەی بارزانەوە دەست پێدەکاتەوە، هەر ئەو کات هێزەکانی حکومەتی عێراقی و هێزەکانی بەریتانیا هێرش دەکەنە سەر بنکەو بارەگاکانی شۆرش و کۆنترۆڵی سەرجەم ناوچەکە دەکەن و مەلا مستەفا بارزانی ناچار دەبێت بە خۆیی و پێنج سەدو شەست پێشمەرگەو سەدان خێزانی کوردەوە بچێتە سنووری ئێران و خۆرهەڵاتی کوردستان، پەیوەندی بە کۆماری مهابادەوە بکات، بە سەرۆکایەتی تێکۆشەری ناوداری کورد شەهید قازی محەمەد.

لە دوای رووخانی کۆماری مهاباد بارزانی بە خۆیی و ئەو پێنج سەدو شەست سەربازەوە رووینکردە سنوورەکانی یەکێتی سۆڤێتو لەوێ مانەوە تا رووخانی رژێمی پادشایەتی و کودەتاکەی عەبدولکەریم قاسم.

لە ئاکامی ئەو گۆرانکارییە مەزنانەی لە بواری ئابووری و نەوتدا روویدا، هەلی کارو سەرچاوەی نان پەیداکردن کەوتە نزیك چاڵە نەوتییەکان، ئەمە جگە لە سیاسەتمەداران خەڵکێکی زۆر چاویان بریبە کەرکوك، لەم شارەش دوای پێشکەوتنی پیشەسازی نەوت خەڵکێکی زۆر روویان کردە دەورووبەری چاڵە نەوتەکان وەك عەرەفەو بابا گوڕگوڕ، کە دەکەونە دووری دوومیل لە باکووری رۆژئاوای چەقی شار، بە ئاشکرابوونی ئەوەی، کە ئەم کێڵگانە لە دەوڵەمەندترین و بەپیتترین کێڵگە نەوتییەکانی جیهانە، لە سەدەی بیستەمدا برێکی زۆر لە ململانێ سیاسییەکان دەستیان خستە کاروباری کەرکوكو کەوتنە تێکدانی باری ئاسایشی ئەم شارە، ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانی قەڵاش کۆچیان بۆ دەرەوەی قەڵاکە کردو لە نزیك ئەو ماڵانە جێگیر بوون، کە کۆمپانیای نەوتی بیانی بۆ کارمەندان و فەرمانبەرانی کۆمپانیای نەوت لە سەر شێوازی کلاسیکیی ئەورووپی دروستیکردبوو، ئەو گەرەکانە ئەو کات لە هەموو گەرەکەکانی تر زیاتر سیمای شارستانییەتی پێوە دیار بوو[١١].

بە دامەزراندنی ئەم گەرەکەو پێشکەوتنی ئابووری و شارەوانی کەرکوك بە تایبەتی بە هۆی ئەو خەڵکە بیانییە زۆرەی، کە بۆ کارکردن و ئیدارەکانی کۆمپانیای نەوت لە کەرکوك نیشتەجێ دەبوون، .

باری سیاسیی و دیموگرافی و کۆمەڵایەتیی خەڵکی شار گۆرانێکی زۆری لە خۆ گرت، بەشێکی زۆری خەڵك بۆ نزیکبوونەوە لە شارستانییەت ماڵەکانیان گوێزرایەوە بۆ نزیك ئەو گەرەکە تازەیەو دەورووبەری، کە دواتر ناوی کەرکوکی نوێیان لێنا.

زۆربەی مێژوونووسان و پیاوە بە تەمەنەکانی ئەم شارە، کە ئەو رۆژەیان لە یادە، باس لەوە دەکەن لە دوای ئەوەی کۆمپانیای نەوتی عێراق (ئای. پی. سی) دەستی بە دەرهێنانی نەوت لە ژێر زەوی کرد، سیمای شار گۆرا، فەرمانبەرو کرێکاری ئینگلیز بە شێوەیەکی بەرچاو زیادیان کرد، کەسانی بیانی لە رێگاوبان و گازینۆکاندا لە زیادبووندا بوون، شێوازی ژیان کەمە کەمە لە گۆراندا بوو[١٢].

بە هۆی ئەم زیادبوونەی خەڵکی بیانی هەندێك جار

تێکەڵ بە خەڵکی سادەو دەسەڵاتدارانی ئەم شارە لە کوردو عەرەبو تورکمان دەبوون، بەڵام ئەمان خوورەوشتێکی جیاوازیان هەبوو، بەشێکی زۆر لە خەڵك، کە پابەندبوون بە ئایینی ئیسلامەوە ئەمانەیان بە کافرو بێدین باس دەکردو نەیاندەویست لێیان نزیك ببنەوە، تورکمانەکان خۆشییان بە چارەی ئینگلیز نەدەهات، چونکە بە دوژمنی دەوڵەتی عوسمانییان دەزانی، کە ئەوان تا ئەمڕۆ بە وڵاتی دایك ناوی دەبەن، دواتر لە دژی دەسەڵاتی قاسم زۆر لە سیخورەکانی کۆمپانیای نەوتو ئینگلیزەکان نزیکبوونەوە، ئینگلیزەکان دوژمنی سەرسەختی کوردبوون. بەردەوام سوپای ئینگلیز هاوشانی سوپای عێراق دژی پێشمەرگە کوردەکان دەجەنگان، عەرەبەکان لە سەرەتاوە زیاتر لە هەموو کەس لە ئینگلیزەوە نزیکبوون. بەڵام دواتر تێڕوانینیان گۆڕا.

*** بەشی شەشەم: کوشتوبڕی گاورباغی:**

یەکێك لەو ڕووداوانەی تا ئەمڕۆش لە یادەوەری نەوەیەکی کەرکوکدا ماوە، ڕووداوی خوێناوی گاورباغییە. لە سەرەتای ساڵی (١٩٤٦)دا لە ئاکامی سیاسەتی ڕووخاندنی کۆمپانیای نەوتی عێراق، کە هەموو ئیمتیازێکی بە فەرمانبەرانی ئینگلیز دەدا لە بەرانبەریشدا کەمترین ماف فەرمانبەرە کەرکوکییەکانی نەدەدا. دەنگی نارەزایی لە دژی ئەم سیاسەتە پەیدابوو. سەرەتا کرێکارانی کۆمپانیای نەوت لە ڕێگای یاداشتێکەوە داواکاری خۆیان بۆ بەڕێوەبەرانی کۆمپانیا بەرزکردەوەو دواتر بەمەبەستی گەیشتن بە چارەسەر چەندین دانیشتنو کۆبوونەوەیان ئەنجامدا، بەڵام نەگەیشتنە چارەسەر، داواکانی کرێکارانی نەوت، زیادکردنی کرێ بوو لە هەشتا فلسەوە بۆ دوو سەدو پەنجا فلسو دانانان بە مافەکانیان بۆ دامەزراندنی سەندیکای تایبەت بە خۆیانو بەرکاهێنانی سیستمی تەئمینات لە دژی نەخۆشییو پیریو کەمئەندامبوونو دانانی سنوورێك بۆ دەرکردنیان بە بێ هۆو بە شێوەیەکی زۆرەملێ، ئەم نارەزاییە بە نەخشەو پلانی حیزبی شیوعیی عێراقی لە (٣)ی تەمووزی ساڵی (١٩٤٦) دا بوو بە یاداشتێك، دواتریش نزیکەی پێنج هەزار کرێکار ڕەزامەندی خۆیان دەربڕی بە سازدانی خۆپیشاندانێك بەمەبەستی گوشار خستنە سەر دەسەڵاتدارانی کۆمپانیا تا وەڵامی داواکارییەکانیان بدەنەوە.

لە (١٢)ی تەمووزی ساڵی (١٩٤٦) کرێکارانی کۆمپانیای نەوت ڕوویانکردە باخچەی گاورباغی بەمەبەستی دەربڕینی نارەزایەتییەکانیان، بەڵام هێزەکانی پۆلیس دەوریان دانو بە شێوەیەکی نامرۆڤانە زیاتر لە دە کەسیان لێ شەهیدکردنو بیستو حەوت کەسیشیان بریندارکرد.

سەرچاوە تورکمانییەکان ئەم ڕووداوە بە موڵکی خۆیان دەزاننو دەڵێن: ئەوانەی لەوێدا شەهیدبوون تورکمان بوونو ئەو تاوانە پلانێك بوو لە دژی تورکمان ئەنجام درا. لە کاتێکدا ئەم ڕووداوە وەك ئەوەی سەرجەم سەرچاوە مێژووییەکان جەختی لە سەر دەکەنەوە بە هاندانو لە سەر داوای حیزبی شیوعی دروستبوو. لە هەمان کاتدا تورکمانەکان ئەوە ڕەتدەکەنەوە، کە تورکمان شیوعی بێتو شیوعییەکان بە دوژمنی سەرسەختی دەوڵەتی دایك دەزاننو دەڵێن: ئێمە گەلێکی ئیماندارین، بەڵام ئەوان کافرو بێ دینن، بۆیە دەگمەنە ڕێژەیەکی بەرچاو لە تورکمان بدۆزیتەوە شیوعی بن. حکومەتی پادشایەتی هیچ گرنگییەك، یان سەنگێکی بە بەعسییەکانو عەرەبە شۆفێنییەکان نەدەدا، بەڵکو چاوی لە چالاکییە سیاسییەکانیان دەپۆشیو هەندێك جاریش بۆ دژایەتیکردنی شیوعییەکان، بە ناڕاستەوخۆ یارمەتیی دەدان[١٣].

ئەو کات بیری شیوعییەت لە دونیادا لە برەودابوو، تەنانەت لە پاڵ دەسەڵاتە پادشایەتییەکان لە زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکاندا شیوعییەت وەك حیزب سەنگێکی زۆری هەبوو، بەڵام بیری نەتەوایەتی شۆڤێنییەت بە پاڵپشتی ئیمپریالیەتی جیهانی بە سەرۆکایەتی ئەمەریکا دەڕۆیشت بەڕێوەو دەبووژانەوەو یارمەتی دەدەران، ئەمەش لە بنەڕەتدا بۆ دژایەتی شیوعییەکانو بەرگرتن لە زیادبوونی ناوچەی دەسەڵاتی یەکێتی سۆڤێت بوو، بە تایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە سەرمایەداری بە سەرچاوەی ئابووریی ئایندەی خۆی دەزانێت.

*** بەشی حەوتەم: شەڕی تورکو ئەرمەن لە کەرکوك:**

لەگەڵ ئەوەی، کە سەرجەم سەرچاوە تورکمانییەکان لە دەسەڵاتی سیاسیو سەربازیو ڕێکخراوە مەدەنیو حکومییەکان، تا ئەمڕۆش دان بەوەدا نانێن، کە کوشتوبڕی ئەرمەنییەکان بە دەستی سوپای تورك لە سەردەمی کەمال ئەتاتورکدا ئەنجامدراوە، هاوکات دەرهاویشتەی ئەم کێشەیە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا گەیشتە شاری کەرکوکو شەڕو ئاکۆکییەکی لەنێوان ئەرمەنییەکانو تورکمانەکاندا لێکەوتەوە، لە ڕاستیدا چەندین هەوڵ بۆ شێواندنی ڕاستییە مێژووییەکان لەلایەن هەندێك لە تورکمانە توندڕەوەکان دەدرێت. بەڵام بە هۆی نادروستیو بێ بەڵگەییو نالۆجیکیی باسەکانییانەوە هەموو ئەو هەوڵانە دەبنە کەف سەر ئاوو تەمەنیان زۆر کورت دەبێت.

کێشەی نێوان تورکو ئەرمەن کێشەی ئەو ڕۆژەی کەرکوك نەبوو، کە لە ئاکامی شەڕی سەربازێکو گۆشتفرۆشێکی تورکمانەوە هەڵگیرسا، بەڵکو ڕەگی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٣٧٥)ی زایینی، کە دەکاتە مێژووی ڕووخانی مەملەکەتی ئەرمەنی، بە دەستی تورکو ڕوسیاو فارس، لەو ڕۆژەوە تورکەکان بەردەوام کوشتو بڕی ئەرمەنییەکانیان کردووە بۆ سەرکوتکردنو کوشتنی گیانی ڕزگاریخوازییان، لە ساڵی (١٨٥٤) بۆ (١٨٩٦) عوسمانییەکان زیاتر لە سێ سەد هەزار ئەرمەنییان کوشت.

لە ساڵی (١٩١٥)دا جارێکی تر بارودۆخی نێودەوڵەتی ئەو هەلەی بۆ تورکیا ڕەخساند، کە مستەفا کەمال بتوانێت گەلی ئەرمەن بە تەواوەتی کوشتو بڕ بکات، هەندێك لە سەرچاوە ئەرمەنییەکان دەڵێن: ئەو کات تورکەکان بە بڕیاری ئەتاتورك زیاتر لە یەك ملیۆنو نیو ئەرمەنو سێ سەد هەزار کوردیان کوشت، لە یادەوەرییەکانی ئەنفەر پاشا، کە یەکێك لە سەرکردەکانی کوشتوبڕەکە بووە، هاتووەو

دەڵێت: پیاوەکانمان بە گولە دەکوشت بە لێدان لە سەریان‌و منداڵەکان بە چەقۆو ژنانیش بە لاقەی سێکسی‌و تەرمەکانم بە زۆری دەخستە رووباری خاپوورەوە.

دەستبەرداربوونی رووسیای بەلشەفی لە ئەو زەوییانەی داگیری کردبوو بۆ تورکیا لە پەیماننامەی بریس لیتۆفیسك لە (٣)ی ئاداری ساڵی (١٩١٨)، تورکەکانی زیاتر هاندا بۆ بەردەوام بوون لە کوشتوبڕی ئەرمەنییەکان.

تورکمانەکانی کەرکوك ئەو کات تا ئەمرۆش تورکیا بە وڵاتی دایك دەزانن، هەر دژایەتیکردنێك بۆ دەوڵەتی تورکیا ئەمان بە دژایەتیکردن لە سەر خۆیانی دەزانن، بۆیە دوای ئەوەی لە شەڕی جیهانی یەکەمدا بە هۆی هاوکاری ئەرمەنییەکان بۆ سوپای رووسیا، کە بەمەبەستی داگیرکردنی ئەستەمبوڵ هاتبوون، دوای شەڕ کەوتنە بەر لێدانی گورزی درندانەیی تورکیا، ئەمەش وای لە تورکمانەکانی کەرکوك کردبوو، کە رق لە ئەرمەنییەکان هەڵگرن‌و بۆ بیانوویەك بگەڕێن بۆ رووبەڕبوونەوەی ئەرمەنییەکان لە کەرکوك.

رۆژانی پێش جەژن لە (٤)ی ئایاری ساڵی (١٩٢٤) ژمارەیەك سەربازی سوپای لیڤی بە جلو بەرگی سەربازیی‌و کڵاو پەڕی سوورەوە، کە ئەو کات لیڤییەکان دەیانپۆشی لە بازاڕی شاری کەرکوکدا پیاسەیان دەکرد، بەمەبەستی کڕینی هەندێك پێویستی، خەڵك بە گشتی سەرقاڵی کڕینی پێوستییەکانی جەژن بوون لەو رۆژەدا یەکێك لەو شمەکانەی، کە قەیرانەکەی دەکەوێتە سەر گۆشتە، چونکە خەڵکی موسڵمان، کە زۆرینەی خەڵکی کەرکوك پێکدەهێنن، رووەدەکەنە بازارەکان بۆ کڕینی گۆشت. قەسابەکانیش چەندین رۆژ لەوەو پێش خۆیان بۆ ئەو رۆژە ئامادە دەکەن، گەڵێك جار شەڕو ناکۆکی دەکەوێتە نێوان قەساب‌و کڕیاری گۆشتەوە، لەو رۆژەدا هەواڵی ئەوە بڵاودەبێتەوە، کە شەڕ لەنێوان گۆشت فرۆشێك‌و سەربازێکی سوپای لیڤیدا دروستبووەو گۆشت فرۆشەکە چەقۆیەکی کردووە بە سکی سەربازەکەدا، ئەمە بۆ خۆی رەنگە حاڵەتێکی زۆر سەیرو سەمەر نەبێت وەك باسمان کرد، بەڵام دواتر رەگی ئەم کێشەیە زۆر دادەبەزێتە خوارەوەو دەبێتە کارەساتێك تا ئەمرۆ نەوەکانی کەرکوك بە گشتی لە بیریان نەکردووە، سەربازەکان دەگەڕێنەوە بۆ بارەگاکانیان‌و کۆمەڵێك سەربازی تر لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن‌و شەڕ قووڵدەبێتەوەو جارێکی تر شەڕی تورکمان‌و ئەرمەن دەستپێدەکاتەوە، بەڵام ئەمجارەیان جیاواز لەوانی تر تورکمانەکان دەبنە قوربانی، یان بە واتایەکی تر تورکمانەکان شەڕێکی دۆڕاو دەخولقێنن‌و خۆیان تیایدا زەرەرمەند دەبن، ئەم شەڕە، کە ئەوان بۆ دەوڵەتی تورکیای دەکەن بە هیچ شێوەیەك سوپای تورکیا فریایان ناکەوێت‌و ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی کەرکوك نەك هەر تورکمان، بگرە کوردو عەرەب‌و ئاشووریش دەکوژرێت، سوپای لیڤی رووی چەکەکانیان دەکەنە خەڵك‌و شەر دەست پێدەکات‌و تورکمانەکانیش چەکە شاراوەکانیان لە ماڵەکانیان دەردێنن‌و دەکەونە شەڕ، بەڵام بەرانبەر لیڤییەکان خۆیان ناگرن‌و زۆریان لێ بریندار دەکرێت‌و دەکوژرێت. دواتر سەربازەکان هێرش دەکەنە سەر جێگای کۆبوونەوەی خەڵکی کەرکوك لە بازاڕو مزگەوت‌و جێگا گشتییەکان‌و دەکەونە لێدان‌و کوشتن‌و دەستدرێژی کردن لە خەڵك، لەبەر ئەوەی کوردەکان لە کەرکوکدا ژمارەیان زۆرینە بووە. بۆیە ئەم شەڕەیان کوردیشی گرتەوە، هەندێك رۆشنبیرو مێژوونووسی تورکمان دواتر دەیانویست ئەم راستییە بشێوێنن‌و ئەم کێشەیە بخەنە سەر کورد، یەکێك لەو شەڕانە هێرشی سوپای لیڤی بوو، کە بەمەبەستی شکاندنی ئابڕووی خەڵکی کەرکوك کرایە سەر گەرماوێکی ژنان بە ناوی جووت حمام لە بازاڕی گەورە، بەڵام ئەو کات دوو پیاوی کەڵەمێردی ئەم شارە، کە هەردووکیان کوردبوون‌و ناسراوبوون لەم شارە، ئەم پیاوانە عەلە بەستی‌و قالەی نحەی جەباری بوون، لێیان دێنە دەست‌و رووبەڕووی سوپای لیڤی دەبنەوەو چەند کەسێکیان لێ بریندار دەکەن‌و دەکوژن، ئەم دوو پیاوە بەرگری دەکەن تا هەموو ئەوژنانە هەڵدێن‌و دواتر بە چەند رۆژێك سوپای بەریتانیاو سەربازەکانی سوپای لیڤی کێومالی کەرکوك دەکەن‌و بە دوای ئەو دوو پیاوەدا دەگەڕێن، بەڵام نایان دۆزنەوە. بەریتانییەکان، کە لەم شارەدا باڵادەست دەبن، دەکەونە خۆیان بۆ کوژاندنەوەی ئەم ئاگرەو چارەسەری گرفتەکە، هەر ئەو رۆژە دەکەونە ئاگادارکردنەوەی خەڵك‌و داوایان لێدەکەن، کە دان بە خۆیاندا بگرن‌و سوپای بەریتانیا تاوانباران‌و سەرپێچیکەران لە هەر لایەنێك بێت سزا دەدات‌و ماف ماف خوراوان وەردەگرێتەوە.

ئەو کات موتەسەریفی لیوای کەرکوك فەتاح پاشا دەبێت. مەندوبی سامیی بەریتانی بە هۆی ئەو کێشەیەوە لە پۆستەکەی لای دەبات‌و لە جێگای سەرۆکی شارەوانیی ئەو کات عەبدولمەجید ئەلیەعقوبی دەکاتە موتەسەریف. پۆلیس‌و سوپای ئینگلیز بۆ دەستگیرکردنی سەرپێچیکەران دەکەونە گەڕان بە دوای ئاژاوەچی‌و تاوانبارەکاندا، چەند تورکمانێك، لەوانە حوسێن ئاغا نەفتچی‌و سلێمان بەگو دەروێش‌و خێروڵڵا حەسەن ئەفەندی‌و چەند کەسێکی تر دەستگیر دەکەن، دواتر بەمەبەستی لێکۆڵینەوەو سزادانی تاوانباران دادگایەك پێکدەهێنن بە سەرۆکایەتی مستەر ریچاردی بەریتانی‌و بە ئەندامێتی عومەر نەزمی، کە بە ئەسڵ خەڵکی قەزای کفری بوو لەگەڵ حاکم سەلیم عەبدولکەریم کەرکولی‌و ئەفسەرێك لە سەرۆکایەتی فرۆکەوانی بەریتانی‌و کەسایەتییەکی ئاشووری بە ناوی مار شەمعوونەوەو سزای تاوانباران‌و سەرپێچیکەران دەدەن.

قوربانییەکانی ئەم رووداوە، تا ئەمرۆ تەمومژاوییەو سەرچاوەکان ژمارەی دروستیان لا نییە، تەنها چەند سەرچاوەیەکی کەم نەبێت لەوانە جەرجیس فەتحوڵڵا دەڵێت: ژمارەی کوژراوەکان پەنجاو شەش کەس بوون بریندارەکانیش بە سەدو دە کەس هەژمار دەکات، کە لە نێویاندا چەند کەسێکی ئاشووریش هەبوون[15]. بەڵام عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی لە (تأريخ الوزارات العراقية)دا ژمارەی کوژراوەکان بە دوو سەد کەس دەخەمڵێنێت.

لە راستیدا تورکمانەکان لە ئەرمەنییەکان بە بیانوو بوون لە سەر ئەو هەڵوێستە دوژمنکارییانەی ئەرمەنییەکان بۆ دەوڵەتی تورکیا هەیان بوو، تورکمانەکانی کەرکوك ئەو

کاتیش دەوڵەتی تورکیایان بە وڵاتی ڕەسەنو دایکی خۆیان دەزانی.

*** بەشی هەشتەم: ڕووخانی ڕژێمی پادشایەتیو دامەزراندنی کۆماری عێراق:**

لە (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨)دا بە کودەتایەکی سەربازیی کۆتایی بە دەسەڵاتی پادشایەتی لە عێراقدا هاتو لە جێگای دەسەڵاتێکی کۆماری بە سەرۆکایەتی زەعیم عەبدولکەریم قاسم دامەزرا. لەم سەردەمە نوێیەدا پەیوەندییەکانی نێوان کوردو تورکمان زۆر ئاڵۆزتر بوو، لە لایەك ئەمە بە هۆی ئەوەی کێشەو گرفتە ناوخۆییەکانی عێراق، کە پێکهاتەیەکی هەمەجۆری هەیە بە تایبەتی لە ڕووی ئایینیو نەتەوەییەوە، لەلایەکی تر بە هۆی نەشو نماکردنی هەردوو بیری سۆشیالیستیو بیری عەرەبی شۆڤێنی، بۆ زیاتر ناشنابوونو تەفسیرکردنی ڕووداوەکانی ئەم سەردەمەی کەرکوكو بارودۆخەکە بە گشتیو حەقیقەتی پەیوەندیی نێوان کوردو تورکمان بە تایبەتی، پێویست وا دەخوازێت سەفەرێك بە مێژووی دروستبوونی بەرهەڵستکارانی ڕژێمی پادشایەتیو شێوازی پێکهاتەی دەسەڵاتی کۆماری بکەین، بە ووردبوونەوەیەك چەند وێنەیەك لە کودەتاکەو شێوازی تەسفییەکردنی حیساباتە سیاسییەکان، ڕۆشناییەکی زۆر دەدات بە ڕاستیو دروستی ئەم باسە. بەتێڕامان لەمێژووی سیاسیی عێراق، ڕاشکاوانە ئەو ڕاستییە دەکەوێتەڕوو، کە لە عێراقدا قاتوقڕیو کوشتو بڕی وابەستەی مێژووی ئەم وڵاتەیە، دەبێت ئەوە لەبیر نەکەین، کە عێراق لە مێژووی دروستبوونییەوە لە کۆی نۆ پادشاو سەرۆك، تەنها یەك کەسیان نەکوژراون، هەشتەکەی تریان بە شێوازی نامرۆڤایەتیو نارەوا دوور لە ڕەوشتو ویژدان دەکوژرێن نەك بە یاسا لە سەر تاوانەکانیان دادگاییکرێنو سزای رەوا بە سەریاندا بسەپێت، دەوڵەتی عێراق لە دوای دروستبوونییەوە لەلایەن ئینگلیزەوەو بە دانانی شا فەیسەڵ بە شای عێراق، لەو کاتەوە تا سەردەمی سەدام حوسێن، ئەم وڵاتە ساتێك ئارامییو بێ شەڕو پیلانی بە خۆوە نەبینیوە.

لە بەیانی ڕۆژی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨)دا قاسم نەخشەکەی بۆ لەناوردانی شا فەیسەڵی دووەم دەست پێدەکات، ئەو کات فەوجێکی سوپای عێراق ڕوو دەکەنە کۆشکی پادشایەتی (کۆشکی ڕەحاب) لە ناوچەی حارسییە لە بەری کەرخ لە بەغدادو فەرمان بە خێزانی پادشایەتی دەدەن، کە لە کۆشك بێنە دەرەوە. مەلیکە عالیەی خێزانی شاغازی دایکی شافەیسەڵی دووەم لە ژێر تۆپباران هاتە دەرەوە قورئانێکی کردبووە سەر شا فەیسەڵی دووەمو داوای کرد لە سەربازەکان، کە نەیکوژن، چونکە کورەکەی هێشتا مێرد منداڵەو لە نەوەی پێغەمبەرە (د. خ)و هیچ تاوانێکی لە دژی گەلانی عێراق ئەنجام نەداوە، لەو کاتەدا وەڵامی مەلیکە عالیە بە فیشەكو تەقە دەدرێتەوەو سەرجەمیان دەکوژرێنو کۆشکی پادشایەتیش دوای بەتاڵانبردن دەسووتێنرێتو پەیکەری شاش بە هەمان شێوەی پەیکەرەکەی سەدام دەڕووخێنرێتو لە شەقام و شۆستەکان ڕادەکێشرێت، بە هەمان شێوەش (وەسی) عەبدولئیللاو نوری سەعیدو سەباحی کوڕیشی دەکوژرێن.

دواتر لە کودەتایەکی تردا بەعسییەکانو قەومییەکان عەبدولکەریم قاسم بە دڕندانەترین شێوە دەکوژنو لە دوای ئەمیش بە پیلانێك عەبدولسەلام عارف دەکوژرێتو تەنها کەسێك لە سەر کورسیی دەسەڵاتی عێراقدا بە زیندوویی ڕزگاری بووەو هەڵهاتووە، کە ئەویش عەبدولرەحمان عارف بوو. دوای ئەویش ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر لەلایەن سەدامەوە دەکوژرێتو سەدامیش بە یاسا لە سەر تاوانەکانی لە سێدارە دەدرێت. لەگەڵ ئەوەی کودەتاکەی قاسم بە هەمان ڕێچکەی کودەتاکەی جەمال عەبدولناسری میسر، کە لە تەمووزی ساڵی (١٩٥٢) ئەنجامدراو کودەتاکەی ساڵی (١٩٤٨)ی یەمەن لە دژی دەسەڵاتی پادشایەتی ئەنجامدراو کاریگەری ئەوانی لە سەربوو، بەڵام شێوازی حوکمڕانیو بناغەی ئایدیۆلۆجیای لەوان زۆر جیاواز بوو.

بە هەمان شێوە یەکێك لە هۆکارەکانی دروستبوونو هاندانی ئەم کودەتایە شکستهێنانی سوپای عێراق بوو لە فەلەستین، ئەفسەرانی عێراق ئەو شکستەیان بە پیلانێك دەزانی، کە لەلایەن سەرۆکەکانیانەوە بە مەبەست ئەنجام دراوە بەمەبەستی شکستهێنانو دارمانی سوپا. ناوکی ئەم کودەتایە لە کۆمەڵێك ئەفسەرەوە دەستپێکردو سەرەتا ئەو ئەفسەرانە بە سەرۆکایەتی رائید ڕەفعەت ئەلحاج سری لە شێوەی گرووپێکدا دروست بوون. لە دوای ساڵی (١٩٥٢) ەوە بە سەرکەوتنی کودەتاکەی جەمال عەبدولناسر، ئەم بزووتنەوەیەش چووە قۆناغێکی پێشکەوتووترەوەو شێوەی ڕێکخراوەی لەخۆ گرت.

ئەو کات بەرهەڵستکاران دووبەرە بوون، هەندێکیان باوەڕیان بە گۆڕینی دەسەڵاتی پادشایەتی بە دەسەڵاتی کۆماری هەبوو، هەندێکی تریان باوەڕیان وابوو کودەتایەك لە شێوەی کودەتاکەی بەکر سدقی، یان ڕاپەڕینەکەی ڕەشید عالی گەیلانی پێویستە، بێ ئەوەی شێوازی حوکم بگۆڕێت بۆ کۆماری.

لە هاوینی ساڵی (١٩٥٦)دا ئەم زانیارییانە دزە دەکاتو دەگاتە بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری سەربازی پادشایەتی، دوای لێکۆڵینەوە لەگەڵ ڕەفعەت حاج ئەلسری هەندێك لە هاوەڵانی تۆمەت ساغ نابێتەوە، بەڵام سەراج دوور دەخرێتەوە بۆ جێگایەکی دوور لە دەسەڵاتو هەندێکیان دەکرێن بە پاشکۆی باڵیۆزخانەکان لە دەرەوەی وڵات، بۆیە سەرکردایەتی ئەم ڕێکخراوە دەگوازرێتەوە بۆ فەریق نەجیب ئەلروبەیعیو دوای دوورخستنەوەی ئەمیش دەگوازرێتەوە بۆ عەبدولکەریم قاسم، بەڵام وەك هاوبەشەکەی قاسم لە کودەتاکە، کە عەبدولسەلام عارف بوو، ئەم پیاوە لە ئاداری ساڵی (١٩٤١)دا پەیوەندیکرد بە یاخیبوونەکەی ڕەشید عالی گەیلانییەوەو دواتریش لە ساڵی (١٩٥٧)دا پەیوەندیی بە ڕێکخراوی ئەفسەرە ئازادەکانەوە کرد.

عەبدولسەلام عارف، عەبدولکەریم قاسم کاندید دەکات بۆ سەرۆکی ڕێکخراو، هەر ئەو کاتە بە هاوڕێکانی دەڵێت: لا زعیم الا کریم، ئەو کات قاسم فەرماندەی لیوای نۆزدە

بوو، عەبدولسەلام فەرماندەی لیوای بیست بوو، لە سەرەتای تەمووزی ساڵی (١٩٥٨)دا لەگەڵ دەرچوونی بڕیارێك بۆ ناردنی سوپا بۆ شەری فەلەستین، ئەم دوو لیوایە لە ناوچەی دیالە جێگیردەبن، بۆ گواستنەوەیان بۆ ئەردەن، دەبوو بە شاری بەغدادا تێبپەڕن، ئەمەش هەلێکی باش بوو بۆ ئەوان بۆ ئەوەی پلانەکەیان جێبەجێبکەن.

دوای سەرکەوتنی کودەتاکە عەبدولسەلام عارف یەکەم بەیانی بە ناوی کۆماری عێراقەوە خوێندەوە، عەبدولکەریم قاسم بوو بە سەرۆك وەزیرانو وەزیری بەرگریو سەرۆکی گشتی هێزی چەکداریو عەبدولسەلام عارفیش بوو بە جێگریو وەزیری ناوخۆ.

عەبدولکەریم قاسمو عەبدولسەلام عارفو هاورێکانی دوو عەقیدەی زۆر جیاواز بوون، بۆیە قاسم بە گەیشتنی بۆ دەسەڵات درکی بەوە کردبوو، کە هاوەڵەکانی لە ژێر کاریگەری جەمال عەبدولناسردانو دەیانەوێت عێراق بە ئاراستەیەکی تردا ببەن، بۆیە هەر زوو لە دوای چەند مانگێك لە گرتنەدەستی دەسەڵات زۆربەی ئەوانەی لە دەسەڵات دوورخستەوە، بە تایبەتی عەبدولسەلام عارفو ڕەفعەت حاج ئەلسری، نەجیب ئەلروبەیعیو نازم تەبەقچەلیو شەوافو ئەحمەد حەسەن بەکرو چەند ئەفسەرێکی تر. قاسم هەر لە سەرەتاوە درکی بە نییەت خراپی ئەفسەرانی هاوڕێی کردبوو بۆیە زیاتر لە شیوعییەکان نزیك بووەوە، ئەوەی عەبدولکەریم قاسمی گەیاندە ئەوەی، کە دەسەڵاتی تاکرەویی خۆی پیادە بکات، جگە لەوەی وەك خۆی زۆر سەرسام بوو بە ئەزموونی یەکێتی سۆڤێتو کاریگەریی کەسانی شیوعی لە بنەماڵەکەی خۆی لە سەر بوو، لە هەمان کاتدا درکی بەو پیلانەیەش کردبوو، کە لە میسرەوە بۆی ئامادە دەکرا بۆیە بە پێویستی دەزانی سۆزی سۆڤێتییەکان بە لای خۆیدا پەلکێش بکات. شێوازی کوشتنی خێزانی پادشایەتی بەو شێوە درندانەو خوێناوییەی کە ڕوویدا پێشتر نە لەلایەن قاسمەوەو نە لەلایەن ڕێکخراوی ئەفسەرە ئازادەکانەوە هیچ پلانو نەخشەیەکی بۆ دانەنرابوو، بۆیە ئەمە بۆ قاسم زەنگێکی ئاگادارکردنەوە بوو لە خووڕەوشتی کودەتاچییەکانو ئەفسەرەکانی هاورێی. ئەمە وای لە قاسم کرد، کە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەسەڵاتەکانی لە دەست خۆیدا کۆبکاتەوە، تا گەیشتە ئەو ئاستەی، کە بڵێت: من گەلی عێراق بە یەکەیەکی سەربازی دادەنێم، گەل سەربازەکانییەتیو منیش فەرماندەی.

عەبدولسەلام عارف لەو ماوە کورتەی، کە لەگەڵ قاسمدا بوو بۆ پاڵپشتی خۆیو بنکەنەکردنی دەسەڵاتی قاسم ڕێگای خۆشکرد بۆ دامەزراندنی چەند حیزبێکی بەرهەڵستکار، لەوانە حیزبی ئیسلامی عێراقیو حیزبی دەعوە، بەڵام دواتر قاسم ئەم حیزبانەی هەڵوەشاندنەوەو تەنها ڕێگای بە حیزبی شیوعی دا لە حکومەتدا بەشدار بن. لە ڕۆژانی سەرەتای دەسەڵاتی کۆماریدا ئەو ڕاستییە بە ڕوونی دەرکەوت، کە قاسمو عەبدولسەلام دووبەرەی ناکۆکنو ئەستەمە بتوانن بە یەکەوە هەڵ بکەن. عەبدولسەلام دەیویست عێراق بکات بە بەشێك لە وڵاتی عەرەبیو ئیسلامیی، قاسمیش دەیویست سەربەخۆیی عێراق ڕابگرێت.

دوای کۆنترۆڵکردنی دەسەڵات بە تەواوی لەلایەن قاسمەوە، توانی عێراق لە ڕژێمێکی خێڵەکییەوە بگوازێتەوە بۆ سیستمێکی هاوچەرخو لەو ماوە کەمەی دەسەڵاتیدا چەندین کاری گەورە ئەنجام بدات، لەوانە دارمانی ڕژێمی دەرەبەگایەتیو دانانی یاسای چاکسازیی کشتوکاڵی (الاصلاح الزراعي)و چاکسازی لە بوارەکانی پەروەردەو تەندروستیو بیناسازی. هەموو ئەمانەش بە گشتی بۆ بەرژەوەندیی چینی خوارەوەو هەژاری گەلی عێراق بوون، بۆیە ئەم پیاوە لای هەژارانو کەمدەرەتانان پیاوێکی خۆشەویست بوو، بەو ماوە کورتە توانی سۆزی زۆرینەی گەل بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، بەڵام داواکردنی قاسم بە گەڕاندنەوەی کوەیت بۆ عێراق لە نامەیەکدا، کە لە (٢٠)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦١) بڵاوی کردەوە، تیایدا ئاماژەی بە هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتننامەکەی ساڵی (١٨٩٩)ی نێوان بەریتانیاو کوەیت کرد، عێراقی بوونی کوەیت لای قاسمو زۆربەی عێراقییەکان ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگر بوو، بۆیە گەلانی عێراق پاڵپشتی ئەم بڕیارەی قاسمیان زۆر بە توندی کرد، ئەویش زۆر بە باوەڕەوە ڕایگەیاند، کە کوەیت بەشێکە لە عێراق.

بۆ ئەم مەبەستەش چەندین کۆبوونەوەو گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوە لە ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق ئەنجامدرا، بەڵام ئەو بڕیارە کۆمەڵێك گرفتی بۆ قاسم دروستکرد، لەوانە لە لایەك عەرەبەکان بە تایبەتی میسرو سوریاو ئەردەن، کە ئەم کارەی قاسمیان دەقۆستەوە بۆ بەرپاکردنی دژایەتییەکی جادەی عەرەبی لە دژی قاسمو لە لایەکی تر، بەریتانییەکان کە تا ئەو کاتەش خاوەنی دەسەڵاتێکی زۆر گەورەی پشت پەردە بوون لە ناوچەکە بەم ویستەی قاسم قەڵس بوونو زیاتر کەوتنە خۆیان بۆ گۆڕینی ڕژێمەکەیو لە ناودانی دارو دەستەکەی، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو پیلانانە، قاسم هەندێك ڕێگاو جێگای گرتەبەر لەوانە، لە ڕووی ناوخۆییەوە شلکردنی جڵەو بۆ شیوعییەکانو میلیشیا چەکدارەکانی، کە ئەو کات بە هێزی (المقاومة الشعبية) ناسرابوون، وەستانەوەی جامیعەی عەرەبی لە دژی داواکەی قاسم بە فیتی جەمال عەبدولناسر بووە هۆی ئەوەی عێراق تووشی گۆشەگیری بێت لەلایەن وڵاتە عەرەبیو ئیسلامییەکانەوە، بۆیە قاسم پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ تورکیاو ئێرانو وڵاتە شیوعییەکانی ئەو کات بە سەرۆکایەتی یەکێتی سۆڤێت پەرەپێدا. کودەتاکەی قاسم لە ساڵی (١٩٥٨) هەر لە سەرەتاوە سۆزی بە لای سۆشیالیزمدا هەبوو، بەڵام دواتر ئاراستەی سۆشیالیستی بە واقعی گرتەبەر، قاسم بەوەی کە لە خێزانێکی هەژارو کەمدەرامەتەوە دروست بووبوو، دەیویست یارمەتی هەژاران بداتو خزمەتی چینی هەژارو ژێردەستەکان بکاتو هاوکات دژایەتیکردنی دەرەبەگو سەرمایەدارانو داگیرکەران بوو بووە بەشێك لە پێکهاتەییو لە ژێر هیچ بیانوویەکدا نەیدەویست لەگەڵیاندا پێك بێت.

سەرکەوتنی کودەتاکەی قاسم تورکیاو تورکمانی بردە قۆناغێکی ترەوە لە لایەك بەوەی کە قاسم دانی بەوەدا دەنا لە عێراقدا تەنها دوو نەتەوە هەیە ئەویش کوردو عەرەبە، هاوکات

لە دەستووری کاتیشدا لە مادەی سێ ئەوە چەسپا، کە کوردو عەرەب هاوبەشن لە نیشتیمانی عێراقدا، ئەمە تورکمانی بە تەواوەتی سەغڵەت کرد، بەڵام دواتر تێکچوونی پەیوەندیی نێوان قاسمو جیهانی عەرەبیو ئیسلامییو ناچاربوونی بە دروستکردنی پەیوەندیی لەگەڵ تورکیاو ئێران دەرگایەکی بۆ تورکمانەکان کردەوە بۆ جارێکی تر خۆیان بخەنەوە کۆشی تورکیاو هاوکات دەوڵەتی تورکیش ئەمان بۆ ئامانجی تایبەتیی خۆی بەکاربهێنێت، لە لایەکی ترەوە تورکمانەکان هەر لە سەرەتاوە نەیانتوانی لەگەڵ دەسەڵاتی قاسمدا هەڵبکەن، بۆیە خۆیان دایە لای بەعسییەکانو قەومییە توندڕەوەکانەوە، بە تایبەتی لە کەرکوك، تورکمانەکان بەوەی، کە بە درێژای ماوەی دەسەڵاتی پادشایەتی لە عێراقدا نەیانتوانیبوو هیچ پێگەیەکی سیاسیی بەرچاویان هەبێت، بۆیە زیاتر خوویان دابووە بازارو کەسابەتو زۆربەی کەناڵەکانی بەرهەمهێنانو بازرگانییان بۆ خۆیان قۆرخکردبوو، بەشێکی زۆر لە سەرمایەدارو بازرگانو دەوڵەمەندو دەرەبەگەکانی ئەو سەردەمەی کەرکوك لە تورکمان بوون، بەم ئاراستەیەش سەد لە سەد لەگەڵ قاسمو شیوعییەکاندا ناکۆك بوونو خۆیان بە دوژمنی ئەم دەسەڵاتە دەزانی.

بۆ زیاتر سەپاندنی خۆیانو دژایەتیکردنی کورد لە کەرکوکدا، تورکمانەکان پەیوەندییەکانیان لەگەڵ عەرەبە توندڕەوەکانو ئەفسەرە عەرەبە شۆڤێنییەکان لە لایەکو دەزگا سیخوڕییەکانی کۆمپانیای نەوتو باڵیۆزو نوێنەرەکانی بەریتانیا لە لایەکی تر دروستکردبوو. زۆر جار لە کاتی کۆبوونەوەو گفتوگۆ لەنێوان سیخوڕەکانی کۆمپانیای نەوتو ئەفسەرە عەرەبە شۆڤێنییەکانی کەرکوك دانیشتنەکانیان لە ماڵە تورکمانە دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتووەکان ئەنجام دەدا.

لە (٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٥٨) بە واتا دوای سێ مانگ لە سەرکەوتنی کودەتاکەی، قاسم بە بڕیارێك عەبدولسەلام عارف لە پۆستی جێگری سەرۆك وەزیران لابردو کردی بە باڵیۆزی عێراق لە بۆن، ئەم ڕووداوە جێگای دڵخۆشی شیوعییەکان بوو، بۆیە زۆر بە گەرمی پێشوازییان لێکردو بە خۆپیشاندانو ڕێپێوانو بە هوتافی بڕوخێت بەعسو مەرگ بۆ بەعسییەت، وەڵامی بڕیارەکەی قاسمیان دایەوە، ئەمەش جێگای خۆشحاڵی بوو بۆ قاسم. لە هەمان کاتدا ئەم ڕووداوە وایکرد دوژمنەکانی قاسم زیاتر یەك بگرنەوە، لەبەر ئەوەی ئەو کات کوردیش بە لایەنگری قاسم لە قەڵەم دەدرا، بۆیە ئەم دۆخە کوردو شیوعییەکانی بردە بەرەیەکەوە، لە بەرانبەر بەعسییەکانو تورکمانە تۆرانییەکانو عەرەبە شۆڤێنیستە توندڕەوەکان، لێرەوە سەرەتای قووڵبوونەوەی ناکۆکییو شەڕی نێوان ئەم دوو لایەنە لە کەرکوك پەرەی سەند.

کورد لە ڕێگای چەند ئەفسەرێکی باڵاوە بەشداری کودەتاکەی قاسمی کرد بوو، ئەمە جگە لەوەی ڕۆشنبیرانی کورد لە نەخشەدانان بۆ کودەتاکە بەشداربوون، بۆیە سەرکردایەتی نوێی کورد پێیان وابوو، کە کێشەی کوردی بەشێکە لە بزاوتی نیشتیمانی عێراق، لە بەرانبەر ئەمەشدا لە دامەزراندنی ئەنجومەنی سیانەی سەرۆکایتیدا، کە یەکێك لەو سێ کەسە عەقید خالد نەقشبەندی بوو وەك نوێنەری کورد دیاریکرا، ئەمە جگە لە بەشداریکردنی کورد لە حکومەتو دانانی ئەفسەرێکی کوردی لە دادگای سەربازیی باڵای تایبەت.

مەلا مستەفای بارزانی گەڕایەوە بۆ عێراقو لەلایەن حکومەتی عێراقو حیزبی شیوعییەوە لە ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٥٨)دا بە گەرمی پێشوازی لێکرا. قاسم یەکێك لە کۆشکەکانی دەسەڵاتی پادشایەتی بەخشییە بارزانی تا تێیدا نیشتەجێ ببێت. ئەم کۆشکە پێشتر نوری سەعیدو وەسی عەبدولئیللای لێ دادەنیشتن.

تورکمانەکانی کەرکوك بە پاڵپشتی ئەفسەرە شۆڤێنییەکان کەوتنە نیگەرانکردنی کوردو شیوعییەکان. لە ڕاستیدا کوردو شیوعییەکان لە یەك ستراتیجدا نەبوون، بەڵام تورکمانە تۆرانییەکان لەبەر ئەوەی بە هانی تورکیا هەڵسوکەوتیان دەکرد. دەبوو دژی کوردبنو هاوکات لەبەر ئەوەی شیوعییەکان لە قاسمەوە نزیك بوونو بەشداری دەسەڵاتی نوێی عێراق بوون، ئەوان هەردوو ئەم لایەنەیان کردبووە یەك بەرەوە.

زاڵبوونی زمانی تورکمانی لە فەرمانگەو بازارەکانی کەرکوك ئەو کات لەگەڵ ژمارەی بوونی تورکمان لەو شارەدا هاوسەنگ نەبوو زۆربەی فەرمانبەرو کارمەندەکاني حکومەت تورکمان بوون، بۆیە پرۆسەکانی ئامارکردنی ساڵی (١٩٥٧) بە شێوەیەکی زۆر فراوانو بەرچاو حاڵەتی ساختەکاری لەخۆ گرت، بە سەدان خێزانی هەژارو نەخوێندەواری کورد بە تورکمان ناونووس کران، ئەم ڕاستییەش لە ساڵی (١٩٥٩)دا بە ئاشکراکردنی ئاکامی ناوونووسەکە ئاشکرابوو بە تایبەتی، کە کاتێك هەندێك خێزانی کورد سەردانی فەرمانگەی ڕەگەزنامەیان دەکردو بۆیان دەردەکەوت، کە بە تورکمان تۆمار کراون، هەندێك لەو خێزانانە دواتر ڕێگای دادگایان گرتەبەر بۆ چاککردنی ناسنامەی نەتەوەییان، کە فەرمانبەرە تورکەکان بە ساختەکارییو فێڵ کردبوویان بە تورك[١٦].

لەگەڵ ئەو هەموو ساختەکارییەشدا لە ئامارەکە کورد هەر زۆرینە بوون، ڕێژەی کورد (٤٨٪)ی تۆمارکردو ئەمە دابەزینێکی لە خۆگرت لە چاو ئاماری ساڵی (١٩٤٧)، کە ڕێژەی کورد (٥١٪)ی کەرکوك بوو لەم ئامارەدا تورکمانەکان بە ڕێژەی (٢١,٥٪) بوون عەرەبیش بە ڕێژەی (٢٠٪)و سەرجەم نەتەوەو گەلانی تریش بڕی تەنها (٧,٥٪)، یان بەرکەوت.

دەرکەوتنی ئەم ڕاستییە بۆ خۆی نیگەرانکردنو بێ متمانەیی دژایەتی تورکمان لە بەرانبەر کوردا زیاتر باڵاو ئاشکرا کرد. شێوازەکانی نیگەرانی خستن لەنێوان تورکمانو شیوعییەکاندا پەرەی سەند تا گەیشتە ئەو ئاستەی لە جادەو بازارەکان ڕکەبەرایەتی یەکتر بکەن. دەگێڕنەوە، دەڵێن: لە یەکێك لە چێشتخانەکاندا پیاوێکی شیوعی، کە سەردانی دەکات داوای کوبەی مۆسکۆ دەکات، خاوەن چێشتخانەکە دەڵێت: کوبەی مۆسکۆمان نییە، ئەویش دەچێتە سەر مەنجەڵەکەو دەڵێت: ئەی ئەوە چییە؟

ئەویش دەڵێ کاکە ئەوە کوبەی حەلەبە، من تائێستا کوبەی مۆسکۆم نەبیستووە، شیوعەیەکە دەڵێت: نەخێر لە ئێستا بە دواوە ئەوە کوبەی مۆسکۆیە نەك حەلەب. شیوعییەکان، کە کۆتری ئاشتیان کردبووە ڕەمزی خۆیان بە زۆری وێنەی کۆتریان دەدا لە بەرۆکیان، لە بەرانبەردا تورکمانەکان وێنەی سەرە پشیلەیان دەدا لە بەرۆکیان، بە واتای ئەوەی ئەم پشیلەیە ئەو کۆترەی ئێوە دەخوات، یان دارلاستیکیان دەدا لە بەرۆکیان، بە واتای ئەوەی ئەو کۆترەی ئێوە بەم دارلاستیکە دەکوژین.

لە ڕاستیدا دۆخی کاتی شیوعییەکانی کردبووە دۆستی کورد، دەنا ئەوان هەردوو گەلی کوردو تورکمانیان بە کەسانی نەتەوایەتیو دواکەوتوو دەزانی، ئەو کات ئەوانەی جلی کوردییان لەبەر بکردایە، یان بە کوردی ڕۆژباشیان بکردایە، بە کۆنە پەرستو دواکەوتوو و سیخوڕو بۆرجوازیەتو دەرەبەگ ناودەبرانو تورکمانەکانیش بە تۆرانیو پیاوی تورکو ئەمەریکا لە قەڵەم دەدران.

لەو سەردەمەدا سەرجەم کرێکارو پاڵەو پیشەوەرو بۆیاغچیی پێڵاوو توێژە هەرە هەژارەکانی ئەم شارە پڕ زێڕو داهاتە کوردبوونو بە دوای ژیانی کوولەمەرگیدا دەگەڕان، کورد ئەوەندە لەم شارەدا بێ بەشکراوە بۆیە هیچ کات نەیتوانیوە ڕۆڵەکانی بخاتە بەر خوێندنو قوتابخانە، تەنها تاکو تەرا نەبێت، کە ئەمانەش ئەو کات بە پەنجەی دەست ئەژمار دەکران[١٧].

تورکمانەکان بۆ بەهێزکردنی پاڵپشتەکانیان شاندێك ئامادە دەکەنو هەواڵەی تورکیای دەکەن بە سەرۆکایەتی یونس عومەرو بە یارمەتی نازم تەبەقچلی، هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا دە هەزار ئیمزا کۆدەکەنەوەو دەیدەن بە وەزارەتی دەرەوەی تورکیاو داوا دەکەن، کە باکووری عێراق بخرێتە سەر تورکیا، بەڵام تورکیا ناتوانێت ئەم داوایەیان بخاتەڕوو، بەڵام یارمەتیان دەداتو پلانیان بۆ دادەنێت، کە چۆن لە کەرکوك خۆیان ڕێکبخەنەوەو هاوپەیمانی ببەستنو دژی هەر هەوڵێکی کوردی بۆ دەستخستنی مافەکانی خۆیان بووەستنەوەو ڕێگەنەدەن بە گەڕاندنەوەی کەرکوك بۆ سەر کوردستان بە هەر نرخێك بێت.

بارزانی لە ڕۆژی (٢٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٥٨) دا ڕۆژی گەڕانەوەی لە ناوچەی بارزانەوە بۆ بەغدا لە سەر داوای هەندێك لە هاوەڵەکانی، کە داوای لێدەکەن شەوێك لە کەرکوك لە ناو ئەفسەران بمێنێتەوە، ئەو ڕۆژە لادەداتە کەرکوك، بۆ پێشوازی لە بارزانی خەڵکێکی زۆر کۆبوونەوە، بەمەش تورکمانەکان زۆر نارەحەتبوونو دەیانویست بە هەر شێوەیەك بێت ئاژاوەیەك دروستبکەن.

لە بەیانی ڕۆژی دووەمدا بڕیاری قەدەغەکردنی هاتووچۆ دراو لە کاتژمێر نۆی بەیانیدا ژمارەیەك لە تورکمانەکان خۆپیشاندانیان دروستکرد لە قۆرییەوە بە ڕێکەوتن بۆ بەردەم بارەگای فیرقەی سەربازی کەرکوك بە پارێزگاری سەربازی چەکداری، خۆپیشاندەران لە دروشمەکانیاندا داوای گەڕانەوەی لیوای موسڵیان دەکرد بۆ وڵاتی دایك (تورکیا). ئەو ڕۆژانە کات لە کەرکوکدا زۆر بە نارەحەتی بەرێوەدەچوو، بارودۆخەکە زۆر ئاڵۆزبوو، تەنها یەك لێخشاندنێکی دەویست تا شەڕ بەرپابێتو تەڕو ووشك پێکەوە بسووتێت.

شیوعییەکان بە پاڵپشتی دەسەڵاتی قاسم ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەسەڵاتی خۆیان لە کەرکوك قایمدەکردو هەڕەشەیان لە تورکمانو قەومییە توندڕەوە عەرەبییەکان دەکرد.

*** بەشی نۆیەم: شکستی کودەتاکەی شەواف، شکستی شۆڤێنیزمی عەرەبیو تەتەروفی تورکمانی:**

لە ڕۆژی (٤)ی ئاداری ساڵی (١٩٥٩) دوای سەردانەکەی عەبدولوەهاب شەواف بۆ کەرکوك لەگەڵ نازم تەبەقچەلیو عەتا خەیروڵڵا لە ماڵی نورەدینی واعز لە کەرکوك کۆبوونەوەیەکیان سازکرد. بەمەبەستی دانانی پلان بۆ تەقاندنەوەی بارودۆخەکەو ڕێکخستنی ڕێگا، یان ئاراستەی ئەو پلانو کودەتایەی، کە دواتر شەواف لە موسڵ بە تەنیا ئەنجامیداو شکستیهێنا. ڕۆژێك دوای ئەو کۆبوونەوەیە مامۆستایەکی تورکمان، کە ناوی زاهیدە بوو بە یاوەری چەند مامۆستایەکی تر کەوتنە دابەشکردنی بلاوکراوە بە ناوی تورکمانە دیموکراتییەکانەوە. دوای چوار بۆ پێنج ڕۆژ لەم ڕووداوە کاتژمێر چواری ئێوارە قوتابخانەی موسەڵڵا، کە لەلایەن کۆمەڵێك تورکمانی تۆرانییەوە بە پاڵپشتی نازم تەبەقچەلی گەمارۆ دەدرێت بەمەبەستی هێرشبردن بۆ سەر قوتابخانەکەو ئازاردانی بەرێوەبەری قوتابخانەکە، مامۆستا سەنییە جەباریو خوێندکارە کوردەکان. ئەم بارودۆخە تا کاتژمێر هەشتی ئێوارە بەردەوام بوو دواتر بلاوەیان لێکرد بێ ئەوەی هیچ کارێکی هێرش بەرانە ئەنجام بدەن، بەڵام لە ئێوارەی ڕۆژی دوایدا بە شێوەیەکی زۆر توندترو قەرەباڵغتر دەستیان پێکردەوەو کەوتنە قسەو جنێو بە مامۆستاو خوێندکارە کچەکانی قوتابخانەکە، بۆیە کوردەکان پەنادەبەنە بەر نازمو داوای لێ دەکەن، کە سنوورێك بۆ ئەو تورکمانە شۆڤێنیانە دابنێت، بەڵام نازم پشت گوێیان دەخاتو بە قسە بەرێیان دەکات. بۆیە کوردەکان ناچاردەبن چەند کەسێك بە جلوبەرگی کوردییەوە بە دوو ئۆتۆمبیلی پیکاب بنێرن بۆ ڕزگارکردنی بەرێوەبەری قوتابخانەکەو خوێندکارەکان، بە گەیشتنی ئەمانە تۆرانییەکان لە دەرگای قوتابخانە دووردەکەونەوە، بەڵام لە کاتی دەرکردنی خوێندکارە کچەکانو گەیاندنیان بە سەیارە هەندێك تورکمان پەلاماری کچان دەدەنو یەکێك لە کچەکان عەباکەی لێدەکەنەوەو دەیدڕێنن. شیوعییەکان لە بەرانبەر ئەم کردەوانەی تورکمانەکان هێزە چەکدارەکانی خۆیان، کە ناوی بەرگری میللی (المقاومة الشعبية)یان لێنابوو ئامادەباشییان پێکردبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر کارێکی توندو تیژیی لە ناکاو دەکەونە حاڵەتی ئامادەباشییەوە.

لەو سەردەمەدا ئەفسەرە قەومییەکان بە فیتی میسرو سوریاو لە لایەکی تر تورکمانەکان بەفیتی تورکیا. لە بەرانبەردا تورکمانەکانی کەرکوکیش بە بەردەوامی سەرقاڵی خۆ پڕچەککردن بوونو ئەو چەکو تەقەمەنییانەی، کە لە سوریاو تورکیاوە بە قاچاغ دەهاتە عێراقەوە بەشێکیان لە

شه‌ تورکمانه‌کانی که‌رکوك ده‌شاردرانه‌وه‌. هه‌ر له‌ سه‌ره‌تای حکومه‌ته‌که‌ی قاسمه‌وه‌ ململانێو ناکۆکی نێوان شیوعییه‌کانو قه‌ومییه‌کان له‌ شاری موسڵدا دروست بوو، بگره‌ له‌ ناوچه‌کانی تری عێراق ئه‌م ناکۆکیو شه‌ڕه‌ توندتر بوو. شیوعییه‌کانو قه‌ومییه‌کان له‌ هیچ بۆنه‌یه‌کدا یه‌کیان نه‌ده‌گرته‌وه‌. له‌ شاری موسڵ شه‌ڕ له‌ هه‌موو جێگایه‌ك هه‌بوو، له‌ سوپاو په‌روه‌رده‌و خوێندنو سه‌رجه‌م فه‌رمانگه‌کانی تری حکومه‌تو جاده‌و ته‌نانه‌ت شوێنه‌ کۆمه‌ڵایه‌تیو شوێنه‌ ئاینییه‌کانیشدا هه‌بوون. شیوعییه‌کان وه‌ك حیزبێکی به‌هێز که‌ خاوه‌ن جه‌ماوه‌رێکی زۆر فراوان بوون، چه‌ندین ڕێکخراوی (ژنانو خوێندکارانو کرێکارانو جووتیاران.. هتد)یان بۆ خۆیان دامه‌زراندبوو، ئه‌مه‌ جگه‌ له‌ ڕێکخراوی (انصار السلام والشبيبة الديمقراطية).

له‌ که‌رکوك له‌به‌ر ئه‌وه‌ی نازم به‌رده‌وام هه‌وڵی ده‌دا ئه‌فسه‌ره‌ کورده‌کان له‌ سوپا دووربخاته‌وه‌و قه‌ومییه‌ شۆڤێنیسته‌کان بهێڵێته‌وه‌. به‌ڵام له‌لایه‌نه‌ مه‌ده‌نییه‌کان شیوعییه‌کان بالاده‌ستبوون، نازم زۆر دژایه‌تی ئه‌فسه‌ره‌ کورده‌کانی ده‌کرد. بۆ نموونه‌ چه‌ندین جار هه‌وڵی دوورخستنه‌وه‌ی فاتیح ... ی داوه‌و به‌رده‌وام ڕاپۆرتی له‌ دژی ناردووه‌ته‌ کۆشکی سه‌رۆکایه‌تی به‌ سه‌رچاوه‌ی شه‌ڕو ناکۆکییه‌کانی که‌رکوکی ده‌زانی. شیوعییه‌کان به‌مه‌به‌ستی سه‌پاندنی سه‌نگی خۆیانو قاسمیش بۆ دژایه‌تی عه‌ره‌به‌ توندڕه‌وه‌کانو به‌عسییه‌کان، که‌ زۆربه‌ی له‌ ناوچه‌ی موسڵدا کۆبببوونه‌وه‌، بڕیاری ڕێکخستنو ئه‌نجامدانی کۆنفرانسی ئاشتییان له‌ شاری موسڵ دا. عه‌بدولوه‌هاب شه‌واف فه‌رمانده‌ی فرقه‌ی موسڵ زۆر هه‌وڵیدا ئه‌م کۆنفراسه‌ له‌ موسڵ نه‌کرێت. بۆ ئه‌م مه‌به‌سته‌ش په‌یوه‌ندی به‌ سه‌رۆك عه‌بدولکه‌ریم قاسمه‌وه‌ کرد، به‌ڵام بێ سوود بوو. بۆیه‌ شه‌واف زۆر تووڕه‌ بوو. بۆ بیانوویه‌ك ده‌گه‌ڕا بۆ ئه‌وه‌ی لێیان بدات، له‌ وته‌یه‌کیدا، که‌ له‌ پێش کۆنفرانسه‌که‌ بڵاویکرده‌وه‌ ووتی: ئه‌گه‌ر لایه‌نگرانی ئاشتی هه‌ر سه‌رپێچییه‌ك بکه‌ن بۆ تێکدانی باری ئاسایش، ئه‌وه‌ گولله‌بارانیان ده‌که‌م، ئه‌مانه‌ نه‌ته‌وایه‌تییان له‌م وڵاته‌ کردووه‌ته‌ ئاوازێکی نه‌شازو ڕۆژانه‌ ده‌خرێته‌ ژێر پێڵاوه‌وه‌.

ڕۆژانی پێش کۆنفرانس بارودۆخی موسڵ سات به‌ سات زیاتر ده‌کوڵا. پڕوپاگه‌نده‌و فیتنه‌کان ترسه‌کانیان زیاتر ده‌کرد. له‌ (٦)ی ئاداردا کۆنفرانسه‌که‌ ئه‌نجامدرا بێ کێشه‌و گرفت. له‌ (٧)ی ئاداردا به‌شداربووان به‌و شه‌مه‌نده‌فه‌ره‌ی بۆیان ته‌رخانکرابوو گه‌ڕانه‌وه‌ به‌غداو شاره‌کانی تر، میوانه‌که‌ بێ ڕوودانی هیچ کارێکی توندو تیژی کۆتایی هات. به‌ڵام له‌ ئێواره‌ی هه‌مان ڕۆژدا دوای ڕۆیشتنی لایه‌نگرانی ئاشتی هه‌ندێك شه‌ڕو لێکپڕژان که‌وته‌ نێوان شیوعییه‌کانو نه‌ته‌وه‌ییه‌کانه‌وه‌. ئه‌و ئێواره‌یه‌ بڕیاری قه‌ده‌غه‌کردنی هاتوچۆ ڕاگه‌یه‌ندرا. له‌ (٨)ی ئاداری ساڵی (١٩٥٩)دا عه‌بدولوه‌هاب شه‌واف یاخیبوونه‌که‌ی خۆی ڕاگه‌یاند. ئه‌و کات ئێزگه‌یه‌ك له‌ موسڵ په‌یدابوو به‌ ناوی شه‌وافه‌وه‌. په‌خشی یه‌که‌م به‌یاننامه‌ی خۆی کردو ڕێککه‌وتننامه‌ی نهێنی له‌گه‌ڵ نازم ته‌به‌قچه‌لی بۆ کوده‌تاچییه‌کان له‌ به‌غدا بۆ ڕووخانی ڕژێمی قاسم ئاشکراکرد. سوپای عێراق له‌ ئاکرێو هه‌ولێر به‌شداری یاخیبوونه‌که‌ی شه‌وافیان نه‌کرد، نازم ته‌به‌قچه‌لی نه‌یتوانیو فریانه‌که‌وت خۆی بگه‌یه‌نێته‌ بزووتنه‌وه‌که‌ی شه‌واف، له‌ موسڵ سوپا بوون به‌ دوو به‌شه‌وه‌، به‌شێك له‌گه‌ڵ شه‌وافو ئه‌وی تر دژی وه‌ستانه‌وه‌. به‌ هاوکاری یه‌که‌ سه‌ربازییه‌کانی سوپای عێراق له‌ ده‌ره‌وه‌ی موسڵ. بزووتنه‌وه‌که‌ی شه‌واف نه‌یتوانی له‌ یه‌ك ڕۆژ زیاتر به‌ردوام بێتو ڕووخاو خۆشی کوژرا.

کوده‌تاکه‌ی شه‌واف ده‌بوو له‌ به‌غداوه‌ ده‌ستپێبکات، به‌ڵام شه‌واف بۆ ئه‌وه‌ی ده‌ستی خۆی پێشبخاتو خۆی ببێت به‌ سه‌رۆكو ڕابه‌ری کوده‌تاکه‌ ده‌ستپێشخه‌ری کرد. شه‌واف وای هه‌ست ده‌کرد ده‌سه‌ڵاتی قاسم زۆر له‌وه‌ لاوازتره‌، که‌ بتوانێت به‌رگری له‌ خۆی بکات له‌ به‌رانبه‌ر یاخیبونی نه‌ته‌وه‌ییه‌کاندا، بۆیه‌ چاوه‌ڕوانی به‌غدای نه‌کرد. هاوکات ئه‌م کوده‌تایه‌، که‌ به‌ پیلانو فیتی کۆماری عه‌ره‌بی یه‌کگرتوو میسر – سوریا دروستبوو، ده‌بوو له‌ ڕێگای موسڵه‌وه‌ له‌ سوریاوه‌ زانیاریو ڕێنمایو هاوکاریان بۆ بێت.

هه‌واڵه‌کانو زانیارییه‌کان هه‌ندێك جار له‌ ڕێگای نازمه‌وه‌ ده‌گه‌یشته‌ کوده‌تاچییه‌کانی دژ به‌ قاسم له‌ به‌غداد. له‌ ڕاستیدا کوده‌تاچییه‌کان هه‌موو له‌ یه‌ك به‌ گومان بوون. نازم بۆ دڵنیابوونی خۆی، که‌ به‌رده‌وام له‌ هاوڕێکانیشی به‌ گومان بوو، ئه‌فسه‌رێکی پله‌به‌رزی خۆی به‌ ناوی عه‌زیز ئه‌حمه‌د شه‌هابه‌وه‌ له‌ ڕێگای موسڵه‌وه‌ نارده‌ سوریا بۆ ئه‌وه‌ی په‌یوه‌ندی به‌ عه‌بدولحه‌مید سه‌راجی وه‌زیری ناوخۆ له‌ هه‌رێمی باکووری کۆماری عه‌ره‌بی یه‌کگرتوو بکاتو جه‌خت له‌ سه‌ر ئه‌و یارمه‌تییانه‌ بکاته‌وه‌، که‌ جه‌مال عه‌بدولناسر په‌یمانیداوه‌ بیدات به‌ کوده‌تاچییه‌کان.

له‌ (٢٥)ی شوبات نوێنه‌ری ته‌به‌قچه‌لی له‌ که‌رکوك به‌ ڕێده‌که‌وێتو له‌ (٢٦)ی شوبات سنووری سوریا ده‌بڕێتو ده‌گاته‌ شاری حه‌له‌ب، له‌وێ سه‌راجو مقدم (حيكمه‌ت)ی به‌ڕێوه‌به‌ری ئه‌منی ناوچه‌ی باکوور ده‌بینێتو قسه‌ له‌ سه‌ر ئه‌و یارمه‌تییانه‌ ده‌که‌ن، که‌ کۆماری عه‌ره‌بی یه‌کگرتوو (میسر – سوریا) بڕیاریان داوه‌ بیبه‌خشن به‌ کوده‌تاچییه‌ نه‌ته‌وه‌ییو به‌عسییه‌کان له‌ دژی قاسم، له‌و کاته‌دا عه‌بدولحه‌مید سه‌راج ده‌ڵێت: پێشتر ئێمه‌ قسه‌مان له‌گه‌ڵ چه‌ند ئه‌فسه‌رێك له‌ موسڵو به‌غداد کردووه‌و په‌یمانمان پێداون، که‌ یارمه‌تییان بده‌ین، له‌وێ ئه‌حمه‌د عه‌زیز نوێنه‌ره‌که‌ی نازم ته‌به‌قچه‌لی ده‌یه‌وێت بزانێت کۆماری عه‌ره‌بی چ یارمه‌تییه‌ك به‌ کوده‌تاچییه‌کان ده‌دات؟ تا نازم دڵنیابکاته‌وه‌و گرنتی سه‌رکه‌وتنی زیاتر بکات. له‌ وه‌ڵامدا سه‌راج ده‌ڵێت: ئێمه‌ به‌بێ به‌رانبه‌ر یارمه‌تیتان ده‌ده‌ین به‌ چه‌كو ته‌قه‌مه‌نیو ئامێرێکی ئێستگه‌و فڕۆکه‌تان پێده‌ده‌ین. شه‌ڕو ناکۆکی نێوان شیوعییه‌کانو نه‌ته‌وه‌ییه‌کان ڕۆژ به‌ ڕۆژ زیاتر چڕ ده‌بووه‌وه‌، جگه‌ له‌ که‌رکوكو موسڵ چه‌ندین شارو شارۆچکه‌ی تریشی گرته‌وه‌ له‌وانه‌ خورماتووو ئاڵتون کۆپریو کفریو هه‌ڵه‌بجه‌و شه‌قڵاوه‌و هه‌ریرو ڕه‌واندز.

له‌ کۆتایی ساڵی (١٩٥٨)دا شیوعییه‌کان توانیان کۆنترۆڵی سه‌رجه‌م ڕێکخراوو سه‌ندیکاو یه‌کێتییه‌کانو

بەرگری میللیو (شبيبة الديمقراطية)و پەروەردەو ئیزگەو رۆژنامەکان بکەن، بەمەش نەتەوەییەکان تووشی بێ ئومێدییەکی زۆربوون. هەر ئەمەش یەکێك بوو لەو هۆکارانەی وای لە شەواف کرد چاوەڕوانی بەغداد نەکاتو بڕیاری ئەنجامدانی کودەتاکە بداتو ئاڵای کۆماری عەرەبی یەکگرتوو لە سەر بارەگای خۆی بەرزبکاتەوەو هاوکات وا پێدەچێت ئەفسەرە سەربەستەکان، کە بڕیاری کودەتایان لە دژی قاسم دابوو لە نێو خۆپیشاندا متمانەیان وونکردبێتو هەر کەسێك دەیویست خۆی دەست پێشخەربێت. ئەمە بۆ خۆی هۆکارێکی سەرەکی شکستەکەیان بوو.

کۆماری عەرەبی یەکگرتوو پەیمانەکانی خۆی بە جێگەیاند لە شەوی (٧ – ٨)ی ئاداری ساڵی (١٩٥٩) بە چەند ئۆتۆمبیلێك چەكو تەقەمەنیو ئامێری ئێستگەیەك لە (تل کوچك)ەوە گەیشتە شەوافو لە عەمباری نهێنی چوار لە فەوجی سێیەم لە سەربازگەی غەزالی حەشاریانداو دواتر لەلایەن ئەندازیارێکی سوری بە ناوی یوسف ئەبو شاهین ئێزگەکە دانراو لە کاتی کودەتاکەدا پەخشی خۆی بە ڕەوانی دەستپێکرد، بەڵام یوسف لە ئاکامی شکستی پیلانەکە کوژرا.

نازم تەبەقچەلی بۆ دڵنیابوون لە ڕێکخستنو سەرکەوتنی کودەتاکە، یەکێك لە ئەفسەرەکانی، کە جەمسەرێکی گرنگی کودەتاکە بوو بە ناوی ئەحمەد شەهاب، نوێنەری خۆیان یونس عەتار پاشایان لە کەرکوکەوە نارده بەغدا تا زانیاریو ڕێنمایی نوێیان لەمەڕ کودەتاکە بۆ بهێنێت، یونس لەوێ پەیوەندی کرد بە (محەمەد سەعید شێخ)ەوە، کە ئەویش یەکێك لە جەمسەرەکانی کودەتاکە بوو، محەمەد سەعید پێی دەڵێت: هیچ شتێك لە ئارادا نییەو ماوەی جێبەجێکردنی دیاری نەکراوە، یونس گەڕایەوە کەرکوكو نازمی لەمە ئاگادارکردەوە.

لە (١)ی ئاداری ساڵی (١٩٥٩)دا ڕەفعەت ئەفسەرەکانی هاوڕێی ئاگادار دەکاتەوە، کە هیچ ئەنجام نەدەن تا ڕێنماییان بۆ دەنێرێت، لە ڕۆژی (٤)ی ئاداردا هەواڵێك لە موسڵەوە گەیشت، کە شەواف یاخیبوونی خۆی لە شەوی (٤) لەسەر (٥)ی ئادار ڕادەگەیەنێت. شەوافو ڕەفعەت حاج ئەلسری دوو بەرنامەو نییەتی جیاوازیان هەبوو، نازم پیاوێك بوو بە دەست هەردووکیانەوە، بۆیە نەیدەزانی ڕوو لە کوێ بکاتو ڕێنمایی لە کامیانەوە وەربگرێت، ئەمە جگە لەوەی نازم پیاوێکی لۆکاڵیو بێ ئاگا بوو لە سیاسەتی دەرەوە، هاوکات پیاوێکی ئازاو جەربەزەش نەبوو، لە کاتی کودەتاکەی قاسمدا ئەم فەرماندەی سوپا بوو لە موسڵ، بڕیار وابوو بگاتە کەرکوك، بەڵام تا دڵنیا نەبوو لە سەرکەوتنی کودەتاکەی قاسم پەیوەندی بە کەرکوکەوە نەکرد. بۆیە قاسم لە نازم دڵنیا نەبوو.

عەقید مستەفا ڕەفعەت حاج ئەلسری پێش کودەتاکەی (١٤)ی تەمووز بە پلەی موقەدەم خانەنشینکرابوو، بەڵام قاسم گەڕانییەوە بۆ وەزیفەو پلەکەی بەرزکردەوەو کردی بە بەڕێوەبەری هەواڵگری سەربازیی، لە ڕۆژەکانی سەرەتای دەستبەکاربوونییەوە ڕەفعەت لەگەڵ باڵیۆزی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو پەیوەندی دروستکردو دواتر پێکەوە لە ڕێگای تەلەفۆنێکی نهێنییەوە لەنێوان بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری سەربازیی عێراقو (میسر – سوریا) دروستیکردبوو، ڕێنمایی لە پاشکۆی سەربازی بە ناوی عەبدولمەجیدەوە وەردەگرت، ئەم پیاوە هێڵی پەیوەندیو گواستنەوەی زانیاریو ڕێنماییەکان بوو لەنێوان جەمال عەبدولناسرو سەرۆکی پیلانەکە ڕەفعەت حاج ئەلسری:

پلانەکانی ڕەفعەت حاج ئەلسری بۆ ئەنجامدانی پیلانەکە دوو ڕێگای دەگرتەبەر، ڕێگای یەکەم ڕەفعەت بە فەرماندەی هێزێکەوە هێرش بکاتە سەر ئەنجومەنی وەزیران لە کاتی کۆبوونەوەی ئاسایی خۆیو وەزیرەکان ناچار بکات بە دەست لە کارکێشانەوەو دانانی وەزیری نوێ لە جێگایانو دامەزراندنی حکومەتێکی نوێ سەر بە کۆماری عەرەبی یەکگرتووو ڕاگەیاندنی یەکێتییەکی دەستوبرد لەگەڵ ئەو کۆمارە، تا شەرعییەت بە هێزەکانیان بدات بە خێرایی بێن بە هانایانەوە. ڕێگای دووەمیش ڕەفعەت حاج ئەلسری وای دانابوو، کە یاخیبوونێکی چەکداریی لە سوپادا ئەنجام بدرێت لە کاتی شکستهێنانی ڕێگەی یەکەم. ووشەی نهێنی نێوان نازم تەبەقچەلیو ڕەفعەت سری ئەوەبوو، کە کاتی چوونە نەخۆشخانە هەمان کاتی جێبەجێکردنی پیلانەکە بێت[19]. یەکێکی تر لە ئەفسەرە یاخیبووەکان عەقیدێکی خانەنشین محەمەد سەعید ئەلشێخ بوو، کە فەرماندەی لیوای چوار بوو، دوای کودەتاکەی (١٤)ی تەمووز لە کۆتایی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٥٨) لە کەرکوکەوە گواسترایەوە بۆ ناو وەزارەتی بەرگری لە کەرکوك، ئەم پیاوە زۆر جێگای متمانەی نازم بوو، زۆربەی پیلانەو کردەوە تێکدەرانەکانی لە ڕێگای ئەمەوە ئەنجام دەدا، لە بەغدایش بازنەی پەیوەندیی نێوان نازمو ڕەفعەت سری بوو، ئەمانەو چەندین ئەفسەری تر، کە بازنەی پیلانەکەیان تەواو دەکرد. کودەتاکەی قاسم کۆتایی بە دەسەڵاتی پادشایەتی هێناو ڕژێمێکی کۆماری لێ پەیدابوو، بەڵام ئەم گۆڕانە کێشەو گیروگرفتەکانی عێراقی چارەسەر نەکرد، بەڵکو لە زۆر لایەنەوە زیاتر ئاڵۆزی کردو زیاتر ڕێگای بۆ دەستتێوەردانی لایەنی دەرەکی ڕەخساند، کە دەستبخەنە نێو کاروباری سیاسیو سەربازیو ئابووریو کۆمەڵایەتی عێراقەوە. ئەم وڵاتە وەك ئەوەی زانای کۆمەڵناسیی عێراقی د. عەلی وەردی باسی لێوە دەکات کۆمەڵێك نێوان دەژیو ناکۆکیی فراوانو قووڵە لە کەسایەتی تاکی عێراقیدا، ئەم وڵاتە سەرەتا بە هۆی ئەوەی درێژەی ناوچەی بیابانی بەرینە، بە زۆری سیماو سیفاتی کۆچەری بە سەردا زاڵە. خوورەوشتی کۆچەر چەند تایبەتمەندییەکی هەیە، کە لە بۆشایی دەسەڵاتو سیستمێکی سیاسیی بەهێزدا سەرهەڵدەداتو سیماو یاساو ڕێسای خۆی دەسەپێنێت. بە بەهێزبوونی ئەو دەسەڵاتەش خوورەوشتو یاساکانی کۆچەری دەکەونە ژێرەوەو وون دەبن، بۆیە بە زۆریی عێراق لە کاتی ڕوودانی هەر گۆڕانکارییەك تووشی نەهامەتیو قاتوقڕیو دزیو فەرهودو گەندەڵیی بووتەوەو زۆر بە گرانی لەو دۆخە ڕزگاری بووە، هەر ئەم خوورەوشتەش هۆکاری ئەوەیە، کە دیموکراسیەتو بەمەدەنیکردنی عێراق لە وڵاتانی

تر گرانترو سەخت تر بێت. بە ڕووخانی ڕژێمی پادشایەتی لە عێراقدا جگە لە سەرهەڵدانی خێڵو هۆزە کۆچەرییەکان چەندین سەرەك هۆزو خێڵو ڕەوشتی کۆچەری لە سیماو بەرگی حیزبو لایەنی سیاسییو کەسایەتی سەربازیدا بۆ قاسم قووتبوونەوە، کە خۆشیی چاوەڕوانی نەدەکرد.

*** بەشی دەیەم: هەڵگەڕانەوەی قاسم لە شیوعییەکانو بادانەوەی بە لای شۆڤێنی عەرەبیدا:**

بە شێوەیەکی گشتی سەردەمی دوای ڕووخانی ڕژێمی پادشایەتی شەڕ لەنێوان هەمووواندا دەستی پێکرد، هەندێك بە ناوی بەرگری لە دەستکەوتەکانی کودەتاوەو هەندێك بۆ بەرگری لە مانەوەی عێراق لە چوارچێوەی نەتەوەی عەرەبیو یەکگرتن لەگەڵ میسرو سوریاداو هەندێك بۆ بەرژەوەندیی نەتەوەکەیان لە وڵاتانی دەرەوە، ئەمە جگە لە شەڕی خێڵو مەزهەبو ئایینو نەتەوەکان.. هتد. هەموو ئەمانە پێکەوە لە سەردەمی نوێدا یەکانگیربوون، ئەم شەڕو ناکۆکییانەش زیاتر لە هەموو جێگایەکی عێراق لە کەرکوکدا تۆخببووەوە، بۆیە قاسمیش بۆ پارێزگاری لە دەستکەوتەکانی چەندین ڕێگاو سیاسەتی گرتەبەر، سەرەتا ڕوویکردە شیوعییەکانو کوردەکان بە فراوانبوونی هێزی شیوعیو داواکردنی کورد بە مافەکانی خۆی، کە قاسم ماوەیەکی زۆر بوو خۆی لێدەدزییەوە، بۆیە جارێکی تر بایدایەوە بۆ لای چەپی عەرەبیو موتەتەریفو کەوتە دژایەتیکردنی دبلۆماسییانەی شیوعییەکانو دوورخستنەوەی کورد لە خۆی. لە لایەك بە داننەنان بە ماق ڕەوای کوردو لە لایەکی تر بە دوورخستنەوەی ئەفسەرە کوردەکان لە دەسەڵاتو پایە سیاسیو سەربازییەکانی نزیك لە خۆی، بەمەش عەرەبە شۆڤێنییەکان پێیان زیاتر لە کەرکوك گیرکردو بارودۆخەکە زۆر ئاڵۆزترو ناهەموارتر بوو، لێرەوە لەگەڵ پەیدابوونی سیاسەتی تەعریبو تەبعیس لە دژی کوردو سەرجەم دامەزراوەکانی دەوڵەتو گۆڕینی سیماو دیمۆگرافیای شار بۆ بەرژەوەندیی عەرەب سەرەتای ڕاپەڕینێکی تری بۆ کورد خولقاندو بەرهەڵستکارانو کورد پەروەرەکان لە ترسی گرتنو ڕاوەدوونانو کوشتنو دروستکردنی تۆمەتی ناهەق بۆیان، بە زۆری ڕوویان کردە شاخ، بەمەش کوردو خەباتی ڕزگاریخوازیی کورد پێی نایە قۆناغێکی نوێوە. لە ڕاستیدا هیچ گەلێك لە دونیادا تایبەتمەندیی گەلی عێراقی نییە، لە هەموو جیهاندا چەك بۆ پاراستنی وڵاتو هاونیشتمانییەکانە بۆ بەرگریکردنە لە خۆ، بەڵام لە دەست ئێمەدا بۆ کوشتنی خۆیە، بۆ چەوساندنەوەی کۆمەڵو گەلی خۆمانە، نەك بۆ دژایەتیکردنی دوژمنێکی دەرەکی. لەم وڵاتەی ئێمەدا ئەوەندە ڕاستییەکان دەشێوێنرێت، کە هەندێك جار ڕووداوەکان تێکەڵ دەبن، ناتوانین دوژمنانمان دیاری بکەین.

(ئارتۆر سالسبۆرگەر) دامەزرێنەری ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز، دەڵێت: زانیارییە ڕاستییەکان لە هەر مرۆڤێك بشاریتەوە، یان زانیاریی هەڵەو کەمو کورتی پێبدەیت. دەتوانیت هەموو ئامێرەکانی بیکردنەوەی تێکبدەیتو ئاستی بیرکردنەوەی داگریتە پلەیەك، کە زۆر لە ژێر ئاستی مرۆڤەوە بێت. ئەوەی مایەی ئازارە ئەم ڕاستییە ڕۆژانە لەم وڵاتەی ئێمەدا دووبارە دەبێتەوە.

جەمال عەبدولناسر لە سەرنجێکی لەسەر گەلانی سوریاو عێراق لە کاتی جیابوونەوەی سوریا لە میسر لە دوای یەکگرتنەکەیان دەڵێت: ئەو گەلە نیوەی ئەندامەکانی سیاسیینو چارەکێکی خۆیان بە پێغەمبەر دەخوێننەوەو توێژێکیان هەیە خۆیان بە خواوەند دەزانن. لە عێراقدا کەسانێك هەیە خوا دەپەرستنو کەسانێك هەیە شەیتان دەپەرستن. هەندێك خێڵو گرووپ هەیە ئەندامێکی دیاری ژن دەپەرستنو بە سەرچاوەی ژیانی دەزانن، ئێمە دەبوو لەگەڵ ئەم گەلەدا مامەڵە بکەین. ناسر ئەم گوزارشتەی بۆ پاساوی شکستەکەی بوو لە عێراق.

لە لایەکی ترەوە بەوەی عێراق بەردەوام جێگای سەرنجو تەماعی چاوبرینی وڵاتانی دەرەوەو دەوروبەر بووە. چ وڵاتانی داگیرکەری خۆرئاوا، یان وڵاتانی هاوسنووری خۆی بێت، جەمال عەبدولناسر یەکێك بوو لەو کەسانەی خەونی بەوەوە دەبینی عێراق بکاتە هەرێمێك لە هەرێمەکانیو بۆ ئەم مەبەستەش چەندین کەس لە باوەڕپێکراوەکانی خۆی ڕاسپارد بۆ دانانی پلان بەمەبەستی ئەوەی، کە عێراق بێتە نێو ئەو یەکێتییەی میسرو سوریا دایانمەزراندبوو، کاتێك، کە قاسم کەوتە دوورخستنەوەی لایەنگرانی جەمال عەبدولناسر لە دەسەڵات، دەسەڵاتدارانی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو کەوتنە ڕەخنەو جنێوو قسەکردن بە عێراقو بەوەیان وەسفکرد، کە ئەمانە ترسێکی گەورە لە سەر نەتەوەی عەرەبو ئایینی پیرۆز دروست دەکەن.

ڕاگەیاندنی یەکەم بەیانی یاخیبوونەکەی شەواف لە شاری موسل بۆ یەکەمجار لە ئێزگەکانی سوریاو میسرەوە ڕاستی ئەم نییەتە دەسەلمێنێت.

لایەنگرانی جەمال عەبدولناسر سەرەتا بە سیاسەتو ڕێگای دبلۆماسیی گوشاریان دەخستە سەر قاسم، تا ڕازی بێت بە یەکگرتنی عێراق لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو. لە چەندین دانیشتنو کۆبوونەوەو ڕاپۆرتدا عەرەبە موتەتەڕریفە نەتەوەییەکانو بەعسییەکان ئەم داوایەیان دەورووژاند، یان لە یاداشتێکی لە (٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٥٨)دا، کە بە شێوەیەکی نهێنی شەواف ئەو ویستەی خۆی بە توندی دەخاتەروو، بەڵام دوای ئەوەی هەموو هەوڵو کۆششەکانیان سەرناگرێت، دەیانەوێ لە ڕێگای پێدانی تەماعی دەسەڵات بە قاسم ئەم یەکگرتنە ئەنجام بدەن. بۆیە لە پێشنیارێکدا جەمال عەبدولناسر داوا دەکات ئەم یەکگرتنە ئەنجامبدرێتو قاسم بکرێتە سەرۆکی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو (میسرو سوریاو عێراق)، بەڵام قاسم ئەم پێشنیارەش ڕەتدەکاتەوە. بۆیە سەرەتای پلانی لێدانی عەبدولکەریم قاسم لەلایەن بەعسییەکانو عەرەبە توندڕەوەکانەوە دەچێتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە. ڕێکخستنی کودەتا لە دژی قاسم لە ژێر کاریگەریی کودەتاکەی میسر هاتەئاراوەو هاوکات بە یارمەتی ئەوان دروستبوو سەرەتا بە خۆڕێکخستنی چەند ئەفسەرێك لە ڕێکخراوێکی سەربازیی بە ناوی بزاوتی ئەفسەرانی ئازاد،

که لەم کەسایەتییانە پێکهاتبوو، دابەشبوون بە سەر چەند ناوچەیەکی عێراقدا:

١. ناوچەی موسڵ پێکهاتبوو لە عەقید عەبدولوەهاب شەواف‌و رەئیسی یەکەم مەحمود عەزیزو موقەدەم خدر مەحمودو نافع داوود.

٢. ناوچەی هەولێر پێکهاتبوو لە عەقید منیر فەهمی‌و داود خەلیل‌و عەبدولجەبار ساڵح‌و عامر تالیب.

٣. ناوچەی کەرکوك پێکهاتبوو لە زەعیم ناظم تەبەقچەلی‌و موقەدەم عەزیز ئەحمەد شەهاب‌و یونس عەتارو عەقید ئیبراهیم ئەلگەیلانی.

٤. ناوچەی بەغداد پێکهاتبوو لە عەقید رەفعەت حاج ئەلسری‌و عەقید محەمەد سەعید ئەلشێخ‌و ئیسماعیل تایەرو محەمەد سەلیم‌و مونعم عەبدولحەمید.

٥. ناوچەی دیوانییە پێکهاتبوو لە زەعیم عەزیز عەقیلی‌و زەعیم حاجی مەحمود شیت‌و سوبحی تەعات.

ئەمانەو چەندین ئەفسەری پلەدار ئامادەی خۆیان دەرخست بۆ کودەتا لە دژی قاسم بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئامانجەش دوو پلان هەبوون:

یەکەم: چەند ئەفسەرێك بە فەرماندەیی رەفعت حاج کودەتایەك ئەنجام بدەن بە هێرش بردنە سەر ئەنجومەنی وەزیران‌و ئەنجومەنی سەرۆکایەتی لە کاتی کۆبوونەوەیان لە وەزارەتی بەرگری‌و ناچاریان بکەن بە گۆڕینی وەزیرەکان‌و دامەزراندنی ئەنجومەنێکی نوێ، ئەگەر ئەم پلانەش سەرکەوتوو نەبوو، ئەوا پلانی یاخیبوون دەست پێدەکات، کە فەرماندەی فیرقەی دوو زەعیم ناظم تەبەقچەلی جێبەجێی دەکات ئەمەش لە ڕێگای ڕاگەیاندنی یاخیبوونێك لە ویلایەتەکانی موسڵ‌و هەولێرو کەرکوك. تەبەقچەلی هەڵدەستێت بە جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانەی، کە لە بەغدادەوە دەردەچێت‌و دواتریش بنکە سەربازییەکان لە دیوانییەو مسەیب ومحاویل‌و ناوچەکانی تر پەیوەندی پێوە دەکەن‌و گرووپێك لە ئەفسەرانی سیخوریش دیاریدەکرێت بۆ دەستگیرکردنی زەعیم عەبدولکەریم قاسم‌و سەرۆکی ئەرکانی سوپاو دواتر چەند مەراسیم‌و بەیاناتێك بە سەرکەوتنی کودەتا رادەگەیەنن، بەڵام عەبدولوەهاب شەوواف هەر لە سەرەتاوە بەم پلانەی رەفعت حاج ئەلسری‌و ناظم تەبەقچلی‌و هاورێکانیان رازی نابێت. بۆیە بێ متمانەیەك دەکەوێتە نێوانیانەوە، بەڵام لای خۆیان بە نهێنی دەیهێڵنەوە، شەوواف لە کاتی یاخیبوونەکەیدا سەرجەم ئەو کەسانە ئاشکرا دەکات، کە لە تۆڕی کودەتاچییەکاندان، ئەمانەش دواتر لە دادگا سزای لە سێدارەدانیان دەدرێت.

پێش یاخیبوونەکەی شەوواف، تەبەقچەلی لە سەر داوای رەفعەت حاج سری‌و هاورێیانی بەغدای، ئەفسەرێك بە ناوی (عەزیز ئەحمەد شەهاب)ەوە دەنێرێتە موسڵ بۆ ئەوەی لەوێوە بگاتە سوریا، بەڵام ئەفسەرانی شەوواف قەناعەتی پێدەکەن، کە نەچێتە سوریا، چونکە ڕێگاکە سەختەو چاودێری لە سەرەو هەر پرسیارێکیشیان هەیە ئەمان دەتوانن وەڵامی بدەنەوە. بێ ئەوەی بچێتە سوریا، دەیگەڕێننەوە بۆ کەرکوك، ناظم تەبەقچەلی بەمە تووڕە دەبێت، سەر لە بەیانی (٢٥)ی شوباتی ساڵی (١٩٥٩) جارێکی تر موقەدەم عەزیز شەهاب دەنێرێتەوە بۆ موسڵ‌و لەوێوە دەچێتە سوریاو عەبدولحەمید سەراج دەبینێت. لە کۆبوونەوەیەکیاندا رەفعەت بە (عەقید ئیبراهیم)دا هەواڵ بۆ ناظم تەبەقچەلی دەنێرێت، داوای لێ دەکات هیچ جوڵەیەك بێ ئاگاداری ئەم‌و بێ ئاماژە لەمەوە ئەنجام نەدات. لە کۆبوونەوەی دووەمدا ووشەی نهێنی، کە ووشەی (چوومە خەستەخانە) بوو دیاری دەکرێت، بەڵام شەواف چاوەڕوانی بەغدای نەکردو بڕیاری یاخبوونەکەی لە (٧ – ٨)ی ئاداری ساڵی (١٩٥٩) ڕاگەیاندو ڕاستەوخۆ ئاڵای کۆماری عەرەبیی یەکگرتووی بەرزکردەوە هەر لە یەکەم بەیاندا بۆ ڕاکێشانی ناظم بۆ هاوشانی خۆی ئەوەی ئاشکرا کرد ئەم یاخبوونەی لەگەڵ هاورێی زەعیم ناظم تەبەقچەلی فەرماندەی فیرقەی دووی کەرکوك ئەنجامداوە.

سەر لە بەیانی ڕۆژی (٨)ی ئادار شەڕو پێکدادان لەنێوان لایەنگرانی کۆماری‌و چەکدارەکانی شەوافدا دەستپێکرد، ئەم دوو لایەنە هەر یەکە لە لای خۆیەوە بە ئاشکرا بڕیاری کوشتن‌و لە سێدارەدانی لایەنی دووەمی ڕاگەیاند. ئەو کات ناظم لە ماڵەکەی خۆیدا چاوەڕوانی دەکرد، ئەگەر کودەتاچییەکان سەربکەون ئەوە ناظم دەبوو بە یەکێك لەوان، ئەگەر نا ئەوە ناظم هیچ پەیوەندییەکی بەو کودەتایەوە نییە، ناظم تا بزووتنەوەی شەواف شکستی نەهێنا پەیوەندی بە فیرقەکەی خۆیەوە نەکرد. بەڵام دوای دڵنیابوون لە شکستەکە ڕاپۆرتێکی نارد بۆ بەغداو ئیدانەی کارەکەی شەواف کرد، ئەمەش لە لایەك بۆ دەربڕینی لایەنگیری خۆی بۆ باوەڕی خۆی بە عەبدولکەریم قاسم‌و ڕەتکردنەوەی بانگەشەکانی شەواف‌و لە لایەکی تر بۆ دڵنیاکردنەوەی هاورێکانی لە ئەفسەرە سەربەستەکانی بەغدا بە فەرماندەیی ڕەفعەت حاج ئەلسری، بەوەی ئەم لەگەڵ (شەوواف)دا ڕێککەوتنی نەبووەو شەواف خۆی بۆ مەبەستی دروستکردنی پاڵپشت ناوی ئەمی هێناوە.

شەوواف بە شکستی خۆی ناوی تەواوی ئەفسەرەکانی هاورێی لە بەغداو شارەکانی تر، ئەوانەی پێکەوە بڕیاری ڕووخانی قاسمیان دابوو ئاشکراکرد، لە دوای شکستەکە شەواف خۆی کوژراوو ئەمانیش لە دادگا بڕیاری لە سێدارەدانیان دراو جێبەجێکرا.

سەر لە بەیانی (٢٥)ی ئاداری ساڵی (١٩٥٩) ناظم تەبەقچەلی دەستگیر دەکرێت‌و دواتریش لەگەڵ هاوبیرەکانیدا دەبرێتە بەر لێکۆڵینەوەو دادگا لە (٢٠)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٥٩) بڕیاری لە سێدارەدان بە سەر ناظم‌و ڕەفعەت‌و سیانزە ئەفسەری پلەداری تر ئەنجامدەدرێت، دەیان کەسیش دوای ئەمان سزای خۆیان وەرگرت لە کوشتنەوە تا زیندانیکردن‌و دەرکردن لە پلەو پایەی سەربازیی.

لە وەڵامی ئەو گلەییانەی لە ناسر دەکرا، لە سەر جێبەجێنەکردنی پەیمانەکانی بۆ پاڵپشتی یاخبوونەکەی شەواف، لە لێدوانێکیدا جەمال عەبدولناسر بەو ئەفسەرو لایەنگرانەی شەواف، کە لە عێراقەوە هەڵهاتبوون ووتبووی: ئێوە تەنانەت نەتانتوانی چەند ڕۆژێك بەرگریی بکەن، تا ئێمە بێین بە هاناتانەوە.

م لە ماوەی دەسەڵاتی فەرماندەیی فیرقە لە کەرکوك، ، زۆر خراپی لە نانەوەی ئاژاوەو دووبەرەکی نێوان کانی کەرکەوك هەبوو. ئەو کات ئەو بە زۆریی پشتی نەکانی دەگرتو تورکمانە تۆرانییەکانی هەڵدەنا وەی ئاژاوەو گرفتو دژایەتیکردنی کوردو حیزبی ی، ئەمەش لە لایەك بەمەبەستی دژایەتیکردنی تەکەی قاسم، کە تا ئەو کاتەش شیوعییەکان یەکێك لە تو دۆستەکانی بوون و هاوکات دوژمنێکی سەرسەختی وڤ عەرەبیو بزوتنەوەکەی جەمال عەبدولناسر بوون، کی ترەوە نازم وەك پیاوێکی شۆڤێنیستی عەرەبی دژی مافەرەواکانی بوو، ئەمە جگە لەوەی تا ئەو کاتەش مگەڵ دەسەڵاتی کۆماریدا لە دانیشتن و گفتوگۆدا بوو، ستی دەستخستنی مافەرەواکانی، نازم کوردی بە ی قاسم دەزانی بە تایبەتی دوای ئەوەی، کە دەرکەوت کان دژی بزاوتەکەی ئەوانن و رۆڵێکی گرنگیان لە تهێنانی خێرای بزوتنەوەکەی شەوافدا کرد، کوردەکان ات زۆر بە خێراییو بێ دوودڵی کەوتنە جووڵە بۆ ی یاخبوونەکە، ئەمەش لە ئاکامی ئەو پەیوەندییە ییەوە بوو، کە لەنێوان قاسمو بارزانیدا مۆر کرابوو. داوای لێکرد هاوکاری بکات بۆ لەناوبردنی ناپاکو ژشانی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو، تەنانەت هەندێك ت وا دەگێرنەوە شەواف بە دەستی چەکدارێکی کورد وە.

یاوە ناودارە کوردەکانی کەرکوك گەلێك جار بۆ یی لە نییەتە خراپەکانی نازم هەوڵیاندەدا لەگەڵ پیاوە رەکانی تورکمان ئەم راستیانە باس بکەن و هەندێك ش پەنایان دەبردە بەر دەسەڵاتی سەرۆکایەتی لە و باسی کردەوە نهێنییەکانی نازمیان بۆ بەغدا دەکرد ەوەی ئاژاوەو کێشە لەنێوان کوردو تورکمان.

ەرماندەی فیرقەی کەرکوكو عەرەبە شۆڤێنیستەکان ەوام راستییەکانیان دەشێواندو تاوان و گرفتیان بۆ کورد مت دەکردو تورکمانەکانیان چەکدار دەکرد، زۆر جار یان بە شیوعیو گێرەشێوێن و لادەرو ناڕۆشنبیرو ناوزەد د. بەردەوام هەوڵی ئەوەیاندەدا ئەفسەرە کوردەکان لە وك دووربخەنەوە، لە یەکێك لە راپۆرتەکانیدا نازم بە کرا داوای لە قاسم کردووە، کە ئەفسەرە کوردەکان لە وك دەربکاتو لە جێیان ئەفسەری عەرەبی بهێنێتو بە دەڵێت: (لقد طلبت الى سيادتكم مساعدتي في تخفيف من الضباط الأكراد المتطرفين، خاصة في كركوك فعينت ـاهم بقصد نقلهم الى وحدات الفرقة الخامسة وتعويض اط من العرب.. الخ).

ازم بەردەوام دژایەتی ئەفسەرانی کوردی دەکرد، بە تی هەردوو ئەفسەری چالاك موکەرەم تاڵەبانیو فاتیح ری، جەباری لە ساڵی (١٩٤٨) یەکێك لە ئەفسەرەکانی دەبێت لە فیرقەی (١٩) لە فەلەستین بەشداریی شەری ائیلی دەکرد، ئەو کات قاسم ئامری فرقەی (١٩) تو پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵدا دروست دەکات، دوای ەوەیان لە فەلەستین و دوای کودەتاکەی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨) قاسم، فاتیح جەباری لە کەرکوك دادەنێت بۆ ئەوەی چاودێری باری نائاسایی ئەو شارە بکات، کە لە دوای ڕووداوەکەی گاوورباغییەوە باڵی بە سەر پەیوەندییەکانی نێوان دانیشتووانی ئەم شارەدا کێشابوو، فاتیح جەباری پیاوێکی باڵابەرزی گەنم ڕەنگبوو، لە کارو ئەرکەکانی زۆر جدیی بوو، بەردەوام لە ڕووی سیخورەکانی کۆمپانیای نەوتو تورکیاو کۆماری عەرەبی یەکگرتوو دەوەستایەوەو ڕێگای نەدەدا بە نازمو هاوکارەکانی شەڕو نائارامییو فیتنە لە کەرکوك دروستبکەن. بۆیە نازم تەبەقچەلی بە هەموو شێوەیەك هەوڵی دوورخستنەوەی دەدا. جەباری دەیزانی شەڕو نائارامیی لە کەرکوکدا نە لە بەرژەوەندیی کوردەو نە لە بەرژەوەندیی قاسمە. بۆیە بەردەوام لایەنگری ئاشتی بوو، هەوڵی ئەوەی دەدا شەڕو پێکدادان لە کەرکوك ڕوونەدات.

پێش دەستگیرکردنی جەباری، ماڵی لە گەڕەکی ئیمام قاسم بوو لە خانووی عەبدوڵڵا ئالتونچی بە کرێ دادەنیشت، دوای ڕووداوەکە عەبدولکەریم قاسم بانگهێشتی دەکات بۆ بەغداو لەوێ پێی دەڵێت: من تۆم لە کەرکوك دانا بۆ ئەوەی ڕێگە نەدەیت کێشەو گرفت دروست ببێت، کەچی تۆ خۆت بووی بە بەشێك لە شەڕو پێکدادانەکان. جەباریش دەیەوێت ئەو ڕاستییەی بۆ ڕوونبکاتەوە، کە ئەم شەڕە هەڵسوکەوتو پلانەکانی ئامر فیرقەی پێشوو نازم تەبەقچەلیو تورکمانە تۆرانییەکان بۆ تێکدانی باری ئاسایشی کەرکوك ئەم پلانەیان گێڕا، بەڵام قاسم ڕازی نابێتو جەباریش بۆی دەردەکەوێت، کە قاسم دەیەوێت بە گرتنیو فەرمانی لە سێدارەدانی ئەمو هاوڕێکانی نەیارەکانی ڕازیبکاتو هاوکات سنوورێکیش بۆ چالاکیی شیوعییەکان دابنێت. بۆیە فاتح جەباری زۆر توورە دەبێتو زۆر بە توورەیی وەڵامی دەداتەوەو هەر ئەو کات قاسم بڕیاری دەستگیرکردنی دەداتو هەواڵەی بەندیخانەی سەربازگەی ڕەشیدی دەکات لە بەغدا، دواتر بە دادگایەکی کارتۆنی فەرمانی لەسێدارادانی دەدات، بەڵام ئەم فەرمانە جێبەجێ ناکات. لە دوای ئەوەی عەرەبە توندڕەوەکانو بەعسییەکان هێزی دەسەڵاتی خۆیان زیاد دەکەنو گوشار بۆ قاسم دێنن لە ئاکامی دوورکەوتنەوەی شیوعییەکانو کورد لێی، قاسم دەیەوێت جارێکی تر دەرگا بۆ شیوعییەکان بکاتەوە، ئەو کات یەکێك لە هاوەڵەکانی خۆی دەنێرێتە بەندیخانە لای فاتیح جەباری بەڵێنی پێدەدات لە بەندیخانە ڕزگاری بکات، بەڵام دەبێت جارێك دان بە خۆیدا بگرێت.

تا ئەو هەلەی بۆ دەڕەخسێتو هەندێك چاو لە سەری کەم دەبێتەوە. لە (١٦)ی شوباتی ساڵی (١٩٦١) تالیبی مەلا داودی جەباری برای فاتح جەباری، خۆیو خێزانەکەی دەچن بۆ سەردانی فاتح جەباری لە زیندان، بەڵام لە ڕێگا پێش ئەوەی بگەنە جێگای خۆیان لە عوزێم لە چۆڵی قوڵفە لەنێوان خاڵسو دووزخورماتوودا دەکەونە بەر دەستدرێژی تورکمانە تۆرانییەکانو تەقەیان لێدەکەنو تالیب خۆییو دوو کوڕی بە ناوی شێرزادو دڵشادەوە، کە تەمەنیان لە سێ تا چوار ساڵ بووە شەهید دەبنو چەند ئەندامێکی تری خێزانەکەی بریندار دەبنو دەیانبەنە نەخۆشخانەی بەعقوبە[٢٠] لە دوای ئەم ڕووداوەش تۆرانییەکان کاغەز فڕێدەدەنە ماڵی تالیب

جەبارەوەو لەوە ئاگاداریان دەکەنەوە، کە ئەوان بۆ کەمالی برای دانیشتوون و ئەمانبوون پێوە، بۆیە واز لە کەمالیش ناهێنن[٢١].

تۆرانییەکان‌و بەعسییە شۆڤێنیستەکان بە شێوەیەکی زۆر فراوان‌و دڕندانە کەوتنە ئازاردانی خەڵك‌و لە دادگاو پۆلیسخانەو سەرجەم فەرمانگەکانی حکومەت کەوتنە ئازاردانی خەڵك، بۆیە کوردی کەرکوك بە زۆری ڕوویانکردە گوندەکان تاکو لە شەڕی ئەمانە ڕزگاریان ببێت. یەکێکی تر لەوانەی، کە تۆرانییەکان‌و عەرەبە شۆڤێنیستەکان ئەو کات بە بەربەست لە بەردەم کارە تێکدەرانەکانی خۆیانیان دەزانی، موکەڕەم تاڵەبانی بوو. ئەم پیاوە زۆر هەوڵی بۆ ئاشتی‌و پێکەوە ژیان دەداو دەیویست لە ڕێگای شیوعییەتەوە سیستمێکی دیموکراتی مارکسیی لە عێراق بەرجەستە بکرێت‌و لە سێبەریدا سەرجەم گەلانی عێراق بە گشتی‌و کەرکوك بە تایبەتی بە ئاسوودەیی بژین، جگە لەمانەش گەلێك پیاوی ناوداری کورد هەبوون، کە هەوڵ‌و کۆششی خۆیان خستەکار بۆ بەرگرتن لە ڕوودانی کاری توندی‌و تیژیی، لەوانە مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی.

ئەو کات تورکیا بە بەردەوامی دەیویست لە ڕێگای تورکمانەکانەوە دەستبخاتە نێو کاروباری کەرکوکەوە، لەوێشەوە بگاتە کاروبارەکانی عێراق بە گشتی. کوردەکان ئەو کاتیش درکیان بەوەکردبوو، کە تورکیا چەك‌و تەقەمەنی‌و پارەو پێویستی بۆ تورکمانەکانی کەرکوك دەنێرێت، لە ڕاستیدا ئەم سیاسەتەی تورکیا تا ئەمڕۆش بەردەوامەو کەسێك نییە لە کەرکوکدا ئەو ڕاستییە نەزانێت، کە تورکیا چۆن بە بەردەوامی یارمەتی تورکمانە توندڕەوەکان‌و ئاژاوەچییەکان دەدات‌و بە نهێنی لە ناو باری لۆری یارمەتیدا، چەك‌و تەقەمەنی بۆ کەرکوك دەنێرێت. دوای دەستگیرکردنی نازم تەبەقچەلی‌و هاوڕێکانی، بەمەبەستی هێورکردنەوەی ناوچەکەو دانانی سنوورێك بۆ عەرەبە توندڕەوەکان‌و تۆرانییەکانی پیاوی تورك‌و سیخوڕەکانی کۆمپانیای نەوت، قاسم داود ئەلجەنابی دەنێرێتە کەرکوك‌و دەیکاتە فەرماندەی فیرقەی دوو لە جێگای تەبەقچەلی، جەنابی پیاوێکی دڵسۆزو ڕاستگۆ بوو بۆ قاسم. نزیك بوو لە شیوعییەکانەوە. ئەمە جگە لەوەی هاوڕێی فاتح جەباری بوو. جەنابی، کە گەیشتە کەرکوك‌و پەیوەندی بە فیرقەی دووەوە کرد، بۆی دەرکەوت هێزی کوردو شیوعییەکان لەو فرقەیەدا زۆر لاوازەو ئەم ناتوانێت هیچ شتێك بکات بۆ دوورخستنەوەی عەرەبە توندڕەوەکان، بۆیە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر کارێکی توندو تیژیی پشتی بە هێزە چەکدارە شیوعییەکان (شبيبة الديمقراطية)ەوە دەبەست.

لە پێش ڕووداوەکە، کوردەکان چەند جارێك حکومەتیان ئاگادار کردبووەوە لەوەی، کە تورکیا چەك بۆ تورکمان دەنێرێت‌و لە ڕێگای نازم تەبەقچەلی‌و ئەفسەرە عەرەبە توندڕەوەکانەوە دەگەیەنرێتە ماڵەکانیان‌و خۆیان بۆ شەڕێکی خوێناوی ئامادە دەکەن.

لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٥٨)دا وەفدێك لە کەرکوکەوە دەچێتە بەغداو سەردانی قاسم دەکات‌و ئەو ڕاستییانەی بۆ پشتڕاست دەکاتەوە، کە تورکمانە تۆرانییەکانی کەرکوك خۆیان پڕچەك دەکەن‌و چەندین عەمباری چەك‌و تەقەمەنیان لە کەرکوك بنیاتناوەو بە لیستێکیش ناوی بیست‌و حەوت ماڵی تورکمان‌و سێ گوندی دەدەنێ، کە چەك‌و تەقەمەنییان لێشاردۆتەوە، بەڵام ئەو ئەفسەرەی، کە قاسم دیاری دەکات بۆ لێکۆڵینەوە لەم ڕاستییانەو داوای لێدەکات لیژنەیەك بۆ ئەم مەبەستە دروست بکات. سەر بە بەرەی تورکمانە تۆرانییەکان دەبێت، بۆیە پێشتر ئاگاداریان دەکاتەوە ئەوانیش جێگای چەك‌و تەقەمەنییەکانیان دەگۆڕن. لە دوای گەیشتنی لیژنەکە بۆ کەرکوك سێ ماڵ هەڵدەبژێرن، لەوانە ماڵەکانی ئیبراهیم نەفتچی‌و عەتا خێروڵڵاو عەقیدی خانەنشین شلیمۆن، بەڵام هیچیان دەست ناکەوێت. لەو سەردەمەدا نازم‌و تۆرانییەکان نەخشەیەکی فراوانیان بۆ دژایەتی کورد هەبوو. ئەمەش نەك هەر تەنها لە بواری سیاسیدا، بەڵکو لە سەرجەم بوارەکانی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و زانستییەوە کاریان دەکرد. بۆ نموونە لە ڕاپۆرتێکی نهێنیدا تەبەقچەلی بۆ بەڕێوەبەرایەتی سیخوڕی سەربازیی دەینێرێت لەمەڕ ڕاپۆرتی مامۆستا کوردەکان، کە بۆ وەزارەت بەمەبەستی چاککردنی باری خوێندنی کوردی لە کەرکوك بەرزیان کردبووەوە، بە توندی دژایەتی دەکات‌و دەڵێت: کەرکوك شارێکی عەرەبی، تورکییەو کوردەکان بە تەماعی نەوت هاتوونەتە ئەم شارەو لە بەرژەوەندیی گەلی عەرەبی دایکە، کە ڕێگا نەدرێت بە کورد لەم شارەدا کاربکەن‌و بمێننەوە. لە ڕاپۆرتێکدا لە (٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٥٨)، کە بە شێوەیەکی نهێنی‌و تایبەتییەو بۆ بەڕێوەبەرایەتی دەزگای هەواڵگری سەربازیی لەمەڕ چاپکردنی کارتی پیرۆزبایی بە زمانی کوردی، کە هێمای بوونی نەوتە لە کەرکوك بەرز دەکاتەوە، ئاماژەی ئەوە دەکات لەو وێنەیەدا سەربازێکی کوردی بە چەکەوە پارێزگاری لە بۆرییە نەوتییەکانی کەرکوك دەکات. نازم پێی وایە ئەم ڕاپۆرتە بۆ بە کوردکردنی شاری کەرکوکەو مەبەست لەم وێنەیە گەڕانەوەی کەرکوکە بۆ سەر ناوچەی کوردستان. لە ڕاپۆرتەکەدا نازم دەڵێت: کەرکوك زۆرینەی تورکمانەو عەرەبەو ئاشووریشی تێدایە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك کوردی تێدا نییە[٢٢] لە ڕاپۆرتێکی تردا، کە نازم بەرزی دەکاتەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی دەزگای هەواڵگری سەربازیی لە سەر ئەو پڕوپاگەندەو نیگەرانییانەی لە کەرکوك لەنێوان کوردو تورکماندا هەیە، دەڵێت: کوردو لایەنگرانی ئاشتی لە بەیانی ڕۆژی (٥)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٥٨)دا هەڵدەستن بە ئەنجامدانی خۆپیشاندانێکی ئاشتییانە، ئەمە لە ناوەڕۆکدا بەمەبەستی نیگەرانکردنی تورکمان‌و عەرەبە. موکەڕەم تاڵەبانی بە کۆکردنەوەی کۆمەڵێك لە بەرەی یەککگرتووی کوردستان لە دەوری خۆی بارودۆخێك‌و نائارامییەکی بۆ خەڵکی کەرکوك دروست کردووە.

لەگەڵ ئەوەی شیوعییەکان لەلایەن قەومییەکانەوە دژایەتیی توونڈ دەکران، کە هەندێك جار زۆر لە ڕژێمی قاسم زیاتر ڕووبەڕووی شەڕو شەڵتاخی قەومییەکان‌و بەعسییەکان‌و پیاوانی ئیمپریالیەت‌و سیخوڕانی کۆمپانیای نەوت دەبوونەوە، بەڵام توانیان لە ماوەی دوو

ساڵی (سەرەتای دوای کودەتاکەی قاسم پێشکەوتن‌و فراوانبوونێکی زۆر مەزن بە خێرایی بە خۆوە ببینن، لە بواری سوپاو هێزی سەربازیدا توانیان دەیان کەناڵ‌و پلەو پایەی گرنگ بۆ خۆیان بکەنەوە، بەڵام ئەوان سیاسەتەکەیان لە سەرەتادا وابوو، کە هیچ هەوڵێك بۆ وەرگرتنی دەسەڵات‌و پۆست، یان شەریکبوونەوەی قاسم نەدەن، بەڵکو ئەوان دەیانویست سەرەتا تەنها کلیلی هەموو دەرگاکانی سیاسیی‌و سەربازیی‌و ئابووری عێراق بگرنە دەست، لە کۆتایی نیسانی ساڵی (١٩٥٩)دا کۆمەڵێك پلەو پایەی سەربازیی گرنگیان گرتەدەست، لەوانە پلەی فەرماندەی فیرقەی دووی کەرکوك‌و لیوای پێنجی فیرقەی دوو لە موسڵ‌و لیوای بیستی فیرقەی سێ (لیواکەی عارف) لە جەلەولاو لیوایەکی فیرقەی یەك لە موسیب لیوای زرێپۆشی شەش‌و هەردوو فەوجی دوو سێی دەبابەو فەوجی موسەنای دەبابات لە فیرقەی چوار لە ئەبوغریب‌و کەتیبەی سێ لە لیوای بیست‌و حەوت لە فیرقەی سێ لە سەربازگەی وشاش[٢٣] ئەمە جگە لە پێگەی مەدەنی‌و رێکخراوەکان، کە بەشێکی زۆریان قۆرخ کردبوو، تەنانەت لە هەندێك جێگادا ئەفسەرە شیوعییەکان ئەوەندەی رێنماییان لە بەرپرسە حیزبییەکانی خۆیانەوە وەردەگرت، ئەوەندە لە بەرپرسانی سەربازییەوە رێنمایی‌و فرمانیان وەرنەدەگرت‌و بریارەکانیان جێبەجێ نەدەکرد، ملیشیا چەکدارەکانی شیوعییەکان، کە بە (المقاومة الشعبیة) ناسرابوون، هاوشانی سوپاو رێکخراوە مەدەنییەکان ژمارەیان بەردەوام لە زیادبووندابوو.[٢٤] ژمارەیان لەنێوان ئابی ساڵی (١٩٥٨) هوە تا ساڵی (١٩٥٩)، لە (١١٠٠٠)هوە بوو بە (٢٥٠٠٠) هەزار کەس. هاوکات توانای سەربازیی‌و چەکسازیشیان بەردەوام پێشدەکەوت. شیوعییەکان لە رووی ناوخۆییەوە توانیان زۆربەی کەناڵە ژیارییەکانی وڵات بگرنەدەست. لە رووی سیاسەتی دەرەکییەوە، شیوعییەکان باڵی یەکێتی سۆڤیەت بوون. ئەو کات هاوسەنگی هێزو سیاسەت لەنێوان دوو وڵاتی داگیرکەردا، کە ئەمەریکاو یەکێتی سۆڤێت بوو دابەشکرابوون. یەکەم بە واتا ئەمەریکای سەرمایەداری کاری نهێنی‌و سیخوری بەکاردەهێنا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی، بەڵام یەکێتی سۆڤێت بۆ هەمان مەبەست باوەری کردبووە ئامرازی دەستخستن‌و داگیرکردنی ئەو وڵاتانە. هەردوو بەرەی شەری عێراقیش لە ناو بازنەی ئەم دوو داگیرکەردا دەسووڕانەوەو بە رێنمایی تەگبیرەکانی، ئەم دوو لایەنە هەڵسووکەوتیان دەکرد.

ئەم پێشکەوتنە مەزنەی حیزبی شیوعی نەك هەر عەرەبە قەومییەکان‌و تورکمانەکانی کەرکوك‌و عێراقی سەغڵەت کردبوو، بەڵکو وڵاتانی قەومیی‌و عەرەبی‌و دراوسێی عێراقیشیان بە تەواوەتی سەغڵەتکردبوو، تا کار گەیشتە ئەو ئاستەی شۆڤێنییەکان گوشار بخەنە سەر شیوعییەکان، تا داوای دەستکەوتی زیاتر نەکەن. هاوکات ئەمریکییەکان ترس‌و دڵەراوکێی زۆریان لێنیشت. ئالان دالاس بەرێوەبەریی هەواڵگری مەرکەزی ئەمەریکا لە لێدوانێکیدا بە ئاشکرا ئەوەی خستەروو، کە بارودۆخی عێراق زۆر ترسناکەو ئەم بارودۆخە ترسناکترین شتە ئەمرۆ لە جیهاندا[٢٥] بۆیە دەبوو ئەمەریکا هەنگاوی جدی بنێت بۆ بەرگرتن لە ترسی لەدەستدانی ناوچە نەوتییەکانی کەنداوو هاوکات دەزگا سەربازییەکانی ئەمەریکاش بەردەوام لە هەوڵی بەهێزکردنی بنکە سەربازییەکانیان بوون لە ناوچەکە.

ئەم ترسە زۆربەی وڵاتانی عەرەبیشی خستە باری نائارامیی‌و دڵەراوکێوە، بۆیە بۆ رووبەرووبوونەوەی ترسی لەناوچوونیان‌و بەرگری لە رەشەبای شیوعییەت کەوتنە لێدانی رۆڵی ترسناکی شیوعییەت‌و شێوە بەرەیەکیان بۆ رووبەرووبوونەوەی شیوعییەکان لە عێراق‌و سوریاو وڵاتانی تری عەرەبی لە لایەك دەستپێکردوو لەلایەکی ترەوە کەوتنە دانانی پلان بۆ شەری قاسم‌و رژێمەکەی. شیوعییەکان درکیان بەم ترسە کرد. بۆیە دەیانویست لە دەسەڵاتی عێراقدا شەریکی قاسم ببنەوەو ئەم ویستەشیان بە قاسم راگەیاند، بەڵام قاسم زۆر بەمە سەغڵەت بوو. راستەوخۆ لەگەڵ بەرپەرچدانەوەیان کەوتە خۆی بۆ لاوازکردنی شیوعییەکان‌و کەمکردنەوەی رۆڵیان.

لە (٢٣)ی ئایاردا، لە کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانیدا قاسم بە ئاشکرا ووتی: کاتێك شۆرشم هەڵگیرساند من هاوبەشم نەبوو، لە هەمان کاتدا لە ترسی قەومییەکان‌و وڵاتانی عەرەبی لە لایەك بەمەبەستی زوویرنەکردنی سۆڤێت بە شێوەیەکی راستەوخۆ نەکەوتە وێزەی شیوعییەکان بگرە زۆرجار وەسفی دەکردن بە کەسانی دڵسۆزو نیشتیمان پەروەر، بەڵام لە چوارچێوەی سیاسەتی لاوازکردنی شیوعییەکان‌و دژایەتیکردنی نهێنی شاڵاوی فراوانبوونیان، قاسم لە (١١)ی حوزەیراندا بە بریارێك لێخۆشبوونی بەندکراوە سیاسییەکانی راگەیاند، بەمەش بە سەدان کەسانی نەتەوەیی‌و لایەنگرانی رژێمی پادشایەتی ئازادکرد، هاوکات رێگای دا بە گەراندنەوەی دوورخراوەکان‌و جڵەوی گوشارەکانی لە سەر ئاغاو دەرەبەگەکان‌و سەرمایەداران شلکردەوە.

رووداوەکانی ساڵی (١٩٥٩)ی کەرکوك قاسمی لە هێزو پێگەی شیوعییەکان ئاگادارکردەوە. شیوعییەکان پێش کەرکوك لە هیچ جێگایەکی تر ئەو سیاسەت‌و هەڵسوکەوتانەیان نەکردبوو. رۆژانی پێش چواردەی تەمووزی ساڵی (١٩٥٩) کەرکوك سەرقاڵی خۆئامادەکردن بوو بۆ ئاهەنگی یادکردنەوەی ساڵانەی کودەتاکەی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨)، بۆ ئەم مەبەستەش لیژنەیەك پێکهێنرا بۆ رێکخستنی کاروباری جەژن‌و شادییەکان‌و رێکخستنی کاروباری خۆسازدان‌و هاوکات چاودێری‌و وریایی ئەو ساردیی‌و گرژییەی، کە لەنێوان کوردو تورکمانەکاندا هەبوون، بە هۆی ئەو کردەوانەوە دروست ببوو.

رۆژی پێش (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٩) دوو سیمای ترسناك هەبوو لە لایەك بەرەی عەرەبە قەومییە شۆڤێنیستەکان‌و تورکمانەکان‌و سیخورانی کۆمپانیای نەوت، کە بە گشتی دژی دەسەڵاتی قاسم‌و شیوعییەکان بوون، بەردەوام خۆیان ئامادە دەکرد بۆ تێکدانی بارودۆخەکەو رێگاگرتن لە یادکردنەوەی کودەتاکەی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨). بۆ ئەم مەبەستەش چەندین رێگاو ئامرازیان

گرتەبەر هەر لە نیگەرانكردنو نانەوەی شەڕو پشێویی‌و هەڕەشەو گورەشە.. هتد. لە بەرانبەریشدا شیوعییەكان لە دوای دەستگیركردنی تەبەقچەلییەوە توانایان لە كەركوك نەك هەر لە ڕووی مەدەنییەوە زیادیكردبوو، بەڵكو توانییان كۆنتڕۆڵی بەشێكی زۆری سوپاش بكەن. لە هەمان كاتدا لە دەزگای ئەمنی كەركوكو پۆلیس توركمانەكان خۆیان ساز دەدا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر ناكۆكیی‌و شەڕێك. لایەنگرانی قاسم‌و شیوعییەكان وەك بەربەرەكانییەك زیاتر خۆیان بۆ مەراسیم‌و جەژنی یادكردنەوەی (١٤)ی تەمووز ئامادە دەكرد، بەمەش لایەنی بەرانبەر زیاتر نیگەران دەبوو. بۆیە هەندێكیان خۆیان ئامادەكرد بۆ بەشداریكردن لەو یادە، بەڵام بە جیا لەلایەنگرانی قاسم‌و شیوعییەكان، تا بتوانن بە ناو جەژن‌و یادی كودەتاكەی قاسمەوە شەڕو ئاژاوە بنێنەوە.

لە ئێوارەی ڕۆژی (١٤)ی تەمووزدا مەراسیمی یادكردنەوەكە دەستیپێكرد. سەرەتا بە شێوەی خۆپیشاندانی ئاشتییانە بە كۆبوونەوەیەكی جەماوەری دەستیپێكردوو ڕووی كردە پردی كۆن لە كۆتایی بازاڕی گەورە، بۆ شەقامی ئەتڵەس‌و ڕووی لە گەڕەكی قۆریە كرد، لە هەمان كاتدا خۆپیشاندانێكی جەماوەری تر گەیشتە كۆتایی شەقامی مەجیدیەو بە دەوری بینایەی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسدا تێپەڕین بۆ شەقامی ئەتڵەس، ئەو كاتە لە گازینۆنی (١٤)ی تەمووزەوەو لە چەند سەرچاوەیەكی نادیارەوە چەند تەقەیەك دەستیپێكرد. دواتر تەقەكان زیادیان كردوو بارودۆخەكە بە تەواوی گرژبوو. خۆپیشاندەران بۆیان دەركەوت، كە ئەو تەقانە لەلایەن عوسمان خدری خاوەنی گازینۆنەكەوە بووە، كە پیاوێكی تۆرانی بوو، بۆیە هەر لەوێ دەیكوژن. ئەمە سەرەتای ئەو كارەساتە بوو، كە دواتر توركمان‌و كورد هەردووكیان باجەكەیان داوە تا ئەمڕۆش ئەم یادە تاڵە لە مێشكی هەردوو لادا دەزرنگێتەوە.

لە دوای ڕووداوەكە بڕیاری قەدەغەكردنی هاتووچۆ بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ڕادەگەیەنرێت‌و سوپاو شیوعییەكان‌و هێزە چەكدارەكەیان (المقاومة الشعبية) دەست دەگرن بە سەر بارودۆخەكەدا. شیوعییەكان بەمەبەستی تۆڵەكردنەوە لە توركمانەكان‌و بۆ ئەوەی هەمان دەستكەوتی موسڵیان هەبێت، كە لەناودانی بزووتنەوەی شەوافدا دەستیان كەوت‌و هاوكات بۆ زیاتر ڕازیكردنی قاسم‌و ڕژێمەكەی، كە تا ئەو كاتەش بە ڕژێمێكی نیمچە شیوعی ناودەبرا، كەوتنە هێرش بردنەسەر توركمانە تۆرانییەكان بە تایبەتی لە هەردوو سینەمای ئەتڵەس‌و عەلەمەین. چەندین كەس كەوتنەبەر لێشاوی شیوعییەكان‌و هەندێك لە ئەفسەرو سەربازانی سەر بە قاسم. لەو ڕۆژەدا چەندین كەس كوژران. زۆربەی هەرە زۆریان توركمان بوون.

هەندێك سەرچاوە دەڵێن ژمارەی كوژراوەكان بیست‌و پێنج كەس‌و بریندارەكانیش سەدو سی كەس بوون، ئەمانە هەموو توركمان بوون.[٢٦] هەندێكی تر پێیان وایە ژمارەی كوژراوەكان سی كەس بوون‌و بە دەیان بریندارێش هەبووەو لە نێو ئەمانەدا عەرەب‌و كوردیش هەبوون.

بۆ بەرگرتن لەم كارەساتە فەرماندەی فیرقەی دوو، هەندێك هەوڵیدا لە ڕێگای پەیوەندیكردن بە كۆمپانیای نەوتەوە بۆ ئەوەی یارمەتی سوپا بدەن بۆ كۆنتڕۆڵكردنی بارودۆخەكەو دواتریش پەیوەندییان بە نەخۆشخانەی كۆمارییەوە كرد، بەڵكو فریای بریندارەكان بكەون‌و لاشەی كوژراوەكان لە شەقام‌و بازاڕەكان هەڵگرن، بەڵام بارودۆخەكە زۆر ئاڵۆز بوو. كەس نەیدەتوانی‌و نەیدەوێرا بێتە بازاڕەوە هەر كەسێك، یان لایەنێك بهاتایەتە ئەو وەزعەوە ئەوەندی بەس بوو، كە یەكێك بڵێت ئەمە تۆرانییە، یان دوژمنی دەسەڵاتی قاسمە یەكسەر دەكەوتە بەر لێدان‌و هێرش‌و كوشتن. لەو ڕۆژەدا ڕێكخراوەكانی (شەبیبەی دیموكراتی‌و شیوعییەكان)و بەرەی نیشتیمانی كەوتنە نیگەرانكردنی توركمانەكان لە خۆپیشاندانێكیاندا بە هەڵگرتنی ئاڵای ڕوسیاو بە وتنەوەی دروشمی (الجبهة جبهة وطنية، صداقة سوفيتية – عراقية، الجبهة، جبهة وطنية، لا إنحراف، لارجعية)و (خەللی یوەللی تەبەقچەلی). هاوكات توركمانەكانیش هاوارو پیاهەڵدانی سەركردە عوسمانییەكان‌و مستەفای ئەتاتوركیان دەكردو داوای گەڕاندنەوەی ویلایەتی موسڵیان بۆ نیشتیمانی دایك، كە بە لایانەوە توركیا بوو، دەكرد.

لەو ڕۆژەدا توركمانە تۆرانییەكان چەندین كەوانەو تابلۆی دروشمیان بە بەرد دروستكردبوو بە ناو بۆ یادكردنەوەی ڕۆژەكە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان تەنها بۆ لێدانی لایەنی بەرانبەرو بۆ شەڕو پێكدادان ئەو بەردانەیان دانابوو. بە ڕاستی حەقیقەتێكی تاڵە ئەو سێ ڕۆژە (١٤)و (١٥)و (١٦)ی تەمووز بە گرانی لە سەر توركمان بەڕێوەچوو. شیوعییەكان‌و سوپا كەوتنە كوشتن‌و هەڵواسینی چەندین توركمان. سەر لە بەیانیی (١٤)ی تەمووز شار خرۆشاو ئاپۆرەی خۆپیشاندان لە چاوگەكانی ناكۆكییە نەتەوایەتییەكانەوە دەستیپێكرد. كورد لە گەڕەك‌و كۆڵانە كوردییەكانەوە بە دروشمی كوردایەتی (پێشرەوەی كورد پارتییە سەرۆكمان بەرزانییە) زۆربەی شەقام‌و شۆستەكانیان داگیركرد، توركمانەكان بە دروشمی دژایەتیكردنی شیوعییەكان بە كەواو چاكەت‌و جامەدانی لە سەر شان وەكو عورفێكی توركمان لە كەركوك‌و شیوعییەكانیش هەردوو بیری نەتەوایەتییان بە دوژمنی خۆیان‌و بیری كۆنەپەرستی دەزانی، ئەو ڕۆژە شەڕ لەنێوان شیوعییەكان، كە بەرگی كوردیان لەبەركردبوو لەگەڵ توركمانەكاندا قەوما هەر هەموو تێكەڵ بە یەك كەوتنەو وێزەی یەكتر. كورد لە توركمان‌و توركمان لە كوردو عەرەب لە هەردووكیان، لەو ڕۆژانە چەندین توركمان دەبەسترا بە دوای ئۆتۆمبیل‌و لە جادەو شۆستەكان ڕادەكێشران، ئەو ئۆتۆمبێلانە بە گشتی سەیارەی ئاسایش‌و حكومەت بوون[٢٧].

ئەم ڕووداوە زۆر لە سەر شیوعییەكان كەوت‌و بە خاڵی وەرچەرخان دادەنرێت لە ژیانی سیاسییان، بەڵام نەك بەرەو بەرزبوونەوە، بەڵكو بەرەو نەهامەتی‌و دامێن‌و كەوتنە بەر هێرش‌و لێدانی سیاسیی‌و دبلۆماسی قاسم، بەمەبەستی وەڵامدانەوەی ئەم ڕووداوە عەبدولكەریم قاسم دووجار لێدوانی دا، یەكەم لە بۆنەی كردنەوەی كەنیسەی (مار يوسف)دا، كە دەچێتە سەر مینبەرەكەو

پەیمانی ئەوە دەدات، کە تاوانبارانی ئەو تاوانانە، واتا کوشتنی تورکمانەکان بە توندی سزا بدات. جارێکی تر لە کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەنووسیدا لە (٢٩)ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٩دا ئەنجامی دەدا ڕووداوەکە دەخاتە ڕوو، بە تاوانێکی زۆر نارەواو نامرۆڤانە باسی لێوە دەکاتو هێرش دەکاتە سەر شیوعییەکانو تانەی ئەوەیان لێدەدا، کە شیوعییەکان لە هەموو کەس زیاتر قسە لە سەر دیموکراسیو ماڤی مرۆڤ و چەوساوەکان دەکەنو کەچی خۆیان بوون بە سەرچاوەی زولمو کوشتنی خەڵکی مەدەنیو دەڵێت: ئایا ئەم کردەوە نەکرێت لەلایەن ڕێکخراوو کەسانی دیموکراتییەوە ئەنجام بدرێت.

لە دوای (١٦)ی تەمووز قاسم هێزێکی سەربازیی لە بەغدادەوە ڕەوانەی کەرکوك دەکات بە گەیشتنیان بەم شارە ژمارەیەکی زۆر هاوولاتیو شیوعییەکان بە ڕەشبگیریی تاوانبارو بێتاوان دەستگیر دەکرێن. یەکەم کار قاسم لە کەرکوك ئەنجامیدا گواستنەوەی داود جەنابی بوو لە کەرکوكو بەندکردنو دانانی عەمید مەحمود عەبدولرەزاق، کە عەرەبێکی نەژادپەرست بوو لە جێگای. تورکمانەکان لە کەرکوك کەوتنە خۆیان بۆ تۆڵەکردنەوە لە کوردو شیوعییەکان. لە ڕۆژی سێیەمدا ڕووداوەکان ئاراستەیەکی تریان وەرگرت لە ڕۆژانی پێشوودا، کە دەسەلاتی شار بە دەست شوعییەکانەوە بوو کەوتبوونە وێزەی تورکمانو کوشتو برو لێدانو ئیهانەکردن لەوپەڕی ناچاریدا بوو، ئەو ڕۆژانە جلو بەرگی کوردی پاسپۆرتی هاتووچۆ بوو لە دوای سێ ڕۆژ کوردو جل وبەرگی کوردی بوون بە قاچاغو شالاوی گرتنو کوشتنو ئیهانەکردنی کورد دەستپێکرد، لە پاڵ کوشتنو گرتنی تاوانباران تورکمانەکان بە پاڵپشتی سوپا کەوتنە ئازاردانو لێدانی خەڵکانی هەژار. تێزابیان بە چاوی چەندین کەسدا کردو دەیان کەسی بێتاوانو بێ گوناهیان شەهیدکرد، ئەم ڕۆژانە بۆ کورد ناهەموارترین ڕۆژ بوو. چەندین کەسایەتی کۆمەلایەتیو پیاو ماقوولو دوکاندارو کاسب ڕۆژانە لە سەر کارو دوکانەکانیان دەکەوتنە بەر لێدانو ئازاردانی تورکمانەکان، بێ ئەوەی هیچ کەسێك بتوانێت لە سەریان هەڵبدات. لە کاتی سکالانووسیندا ئەگەر تورکمان دەستی لە کوردێك بوەشاندایە دەستدرێژی لە کوردێك بکردایە ئەوە لە پۆلیسخانە هەر کوردەکەیان دەگرتو ئازاریان دەدا، بۆیە کوردەکان نەیاندەوێرا بچنە گرتووخانەو پۆلیسخانەکانیش. دوکاندارە کوردەکان بە گشتی (ئەوانەی دووکانەکانیان دەکەوتە ناوچەی قۆریەو بازاری گەورە) لە ترسی تورکمانەکانو لە ترسی ئەوەی تێزاب نەکرێتە چاویان، کە ئەو کات پیشەیەکی نوێی تورکمانەکان بوو، ڕایاندەکردو دوکانەکانیان دەگواستەوە ناوچە کوردییەکان، یان هەر دوکانەکانیان دادەخست. لەوانە سەرجەم دوکانەکانی بازاری قەیسەری گەورە کوردبوون، دوکانەکانیان بەجێهێشتو بەشێك لە دوکانەکانو گەڕەکە کوردنشینەکان بە تالان دەبرانو خاوەنەکانیشیان نەیاندەوێرا لە سەری هەڵبدەنو شکایەت بکەن، هەندێك لەو کەسانەی ئەو ڕۆژە تێزابیان کرایە چاو ئەحمەد ڕەزاو فەتحوڵلای محەی نازەی جەباریو چەندانی تر.

لە دوای دادگایکردنو سەپاندنی تاوانەکە بە سەر کوردو شیوعییەکاندا لێشاوی نەفیکردنی هاوولاتیانی کورد دەستیپێکردو بە سەدان کەس نەك بە تەنیا ئەوانەی فەرمانبەرو کارمەندو ئەفسەری حکومەت بوون، بەڵکو خەڵکی مەدەنیشی گرتەوە.

لەو کێشەیەدا هەندێك پیاوی کوردو تورکمان هەبوون، دووربینانە دەیانڕوانییە کێشەو گرفتەکانو نەیاندەویست، یان ئەم کارەساتەیان پێخۆش نەبوو، لەوانە سەرەتا عەلە بەستیو چەند کوردێکی تر بە دەیان تورکمانیان لە کوشتنو ئازاردان ڕزگارکردو دواتریش خەلیل ئاغا چەندین کوردی لە کوشتنو مردن ڕزگاردەکرد. (ئەگەرچی خەلیل ئاغا موختار بوو، هاوکات بە پارەو بەرتیل پارمەتی کوردەکانی دەدا، بەلام کوردێکی زۆری لە مردن ڕزگارکرد) ئەو کوردانەی، کە لە بەغدادو لە دادگا بێتاوان دەردەچوونو بە (تەسفیرات) دەگەڕێنرانەوە بۆ کەرکوك. لە کەرکوك دۆسیو فایلەکانیان وون دەکراو بە تایبەتی لە مەرکەزی سەرای گشتی، یان دەیانکوشتن، یان جارێکی تر دەیانگەڕاننەوە بۆ بەغداد بە تۆمەتێکی نوێوە.

لە ڕاستیدا بەشێك لەو تورکمانانە، کە کوردیان دەکوشت بە ئەسڵ خەڵکی ئێران بوون، لە ساڵی (١٩٤٨)دا ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانە ڕوویانکردە عێراق بە گشتیو کەرکوك بە تایبەتی. ئەمانە بە زۆری خەڵکی هەژارو کەمدەرامەت بوونو بە دوای کاسبیدا هاتبوونو زۆربەیان لە خانەکانی کەرکوکدا کاریان دەکرد. ئەو خانانە وەك خانە سپیو خان گاورەکانو خانە چاڵەکە.. هتد. بە گشتی موڵکی تورکمانەکان بوون. بۆیە ئەو ئێرانییانەی لەو خانانەدا مانەوەو کاریان دەکرد فێری زمانی تورکمانی بوون بۆ خۆپاراستنو خۆگونجاندن، دوای ساڵی (١٩٥٨) زۆربەیان خۆیان کرد بە تورکمان. یەکێك لەو کەسانەی، کە دەیان کوردی کوشت سەلاح دەرزی بوو. ماڵی لە گەڕەکی بلاخ بوو، بەلام لە بنەڕەتدا خەڵکی سنە بوو. تا ئەمرۆش نەوەکانی دەرزیو خزمەکانی بوون بە دوو بەشەوە، هەندێکیان کوردنو هەندێکیشان تورکمانن. ئەم پیاوە هەر لە سەر کورد کوشتن دواتر لە گەراجی حەویجەو نزیك بازاری گەورە لێدەدرێتو دەکوژرێت. هەندێك لە تورکمانەکان بەمەشەوە ناوەستنو دواتر بە دوای بەندکراوەکاندا دەچنە بەغدادو لە دادگا شایەتی درۆیان لە سەر دەدەنو تۆمەتی شیوعییەتیان دەخستە پاڵو سوێندی درۆیان لە سەر دەخوارد تا سزای توندیان بە سەردا بسەپێت. تورکمانەکان دەڵێن: لە سێ ڕۆژی پێشوودا کوردەکان نەك تەنها لە شاردا، بەڵکو لە گوندەکانیشەوە دەهاتن بۆ شەڕو لێدانی تورکمان، بەلام لە ڕاستیدا لە ڕۆژی (١٥)ی تەمووزدا واتا ڕۆژی دووەم بە فەرمانی سەربازیی فەرماندەی فیرقە ڕێگەیان لە هاتنی گوندنشینە کوردییەکان گرت بێتە کەرکوك. لەم گێرەشێوێنییەدا عەرەبە شۆڤێنیستەکانیش کەوتنە پشت تورکمانە تۆرانییەکانو ولاتانی دەرەوە وەك ئێرانو تورکیاو کۆماری عەرەبی یەکگرتوو هەریەك بە ڕێگایەکو هەریەك بە مەرامێك ئاگری ئەو شەڕەیان خۆشدەکرد. بەڕێوەبەری

ئەمنی كەركوك ئەو كات رۆڵێكی زۆر خراپی لە خۆشكردنی ئاگرەكەو هەڵنانو پاڵپشتی توركمانەكان هەبوو بۆ لێدانی كورد بە چەندین راپۆرت، كە هەواڵەی بەرێوەبەرایەتی گشتی ئەمنی بەغدای دەكرد. پێداگریی لە سەر ئەوە دەكردەوە، كە كوردو شیوعییەكان سەرەتا بە تەقەكردن لە خەڵكو سەربازەكان دەستیان كردووە بە ئاژاوە نانەوە، ئەمەش زۆر ناراستو دروست بوو، چونكە سەربازەكانو شیوعییەكانو خەڵك لە یەك بەرەدابوون، بەڵام دەسەڵات بەمەبەستی لێدانی كوردو شیوعییەكان هەموو ئەو قسانە بە راست وەردەگرێت. لە راپۆرتێكی تردا باس لەوە دەكات ئەفسەری خانەنشین مەلا داودی جەباری لە بەرەی نیشتیمانیو جەبار محەمەد پیرۆزخان لە (إتحاد الشبيبة)و چەند كەسێكی تر لە ئەفسەرو پۆلیسەكان لە (١٥)ی تەممووزدا پلانی ئەوە دادەنێن هەموو ئەو كەسانە كوشتو بر بكەن، كە لە دژی ئەوان دەوەستنەوە. لە راستیدا ئەم پیاوانە نەیاندەویست شەر دروست بێت، چونكە بە هیچ شێوەیەك شەر لە بەرژەوەندیی خۆیانو حیزبەكەشیاندا نەبوو. بە تایبەتی فاتح مەلا داودی جەباری، كە پیاوێكی زۆر نزیك بوو لە قاسمو ئەو خۆی بۆ ئەوە هێنابوویە كەركوك بۆ ئەوەی نەهێڵێت شەرو پێكدادان لەنێوان كوردو توركماندا دروست بێت، چونكە بۆ خۆی دركی بەوەكردبوو، كە زەمینەیەكی لەو شێوەیە بۆ شەرو نانەوەی پشێوییو تێكدانی باری ئەمنی هەیەو سیخورانی كۆمپانیای نەوتو ئاغاو دەرەبەگەكانو خاوەن موڵكو دەوڵەمەندەكان، كە قاسم بە توندی لە بەرژەوەندییەكانی دابوون لەگەڵ سیخورانی كۆماری عەرەبیو ئەتاتوركییەكان لە هەموو لایەكەوە هەوڵی نانەوەی شەرو كوشتاریان دەدا.

ئەم رووداوەی كەركوك لە لایەكی ترەوە رەنگدانەوەی ئەو ئاژاوە سیاسییە بوو، كە عێراق پێیدا تێدەپەری، رۆژی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٩) نەك هەر ساڵیادی كودەتاكەی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨) بوو، بگرە وا رێككەوتبوو ساڵیادی جەژنی عاشورای شیعەكانیش بوو. بۆیە ئەم یادە لە باشوورو ناوەراستیش چەندین شەرو پێكدادانی خوێناویی لێكەوتەوەو بە دەیان كەس لەوێش بوونە قوربانی. بۆیە ئاساییە، كە ئەم رووداوە لە پێش رووداني زۆر كەس دركی پێدەكردو تەنانەت هەندێكش زۆر بە جدیی هەوڵیاندا كارەسات نەقەومێت، بەڵام پیلانگێرانو دوژمنانی كوردو توركمان زۆر لە خێرخوازان زیاترو بەهێزتربوون بۆیە توانیان ئەو یادەوەرییە تاڵە بخەنە مێژووی پەیوەندی كوردو توركمانەوە.

مەلا جەمیل رۆژبەیانی پێش رووداوەكە دەچێتە كەركوكو دەبینێت بارودۆخەكە زۆر خراپەو وەك خۆی دەڵێت هەندێك هەرزەكاری كوردو توركمان چەقۆ لە یەك دەسوونو خۆیان بۆ گیان یەكتر گیڤ دەكەنەوەو هەرەشەی یەكتر كوشتن دەكەن. بۆیە رۆژی (١١)ی تەمموز دەچێتە لای وكیلی قائدی فیرقە مەحمود عەبدولرەزاقو پێی دەڵێت: من بارودۆخی ئێرەم بە دڵ نییە. وا دیارە لەم جەژنەدا هەرایەك دەقەومێت لە دژی كوردو توركمان تەنها بۆ ئەوەی بكرێن بە دوژمنی یەكتر. هاوكات سەردانی چەند كەسێكی ترى نزیك لە دەسەڵاتو چەند كەسێكی ناوداری كوردو توركمان دەكاتو لەو بارودۆخە ئاگاداریان دەكاتەوە. لە دوای رووداوەكەش زانیارییەكان وا دەگاتە زەعیم (٤٨٠) كەس كوژراونو بە هەزاران كەسیش بریندارن. بۆیە زەعیم فەرمان دەداتو سوپا رەوانەی كەركوك دەكات. مەلا جەمیل بۆ راستكردنەوەی ئەم فیتنەیە دەگەرێتەوە كەركوكو ناوی سەرجەم كوژراوەكانو بریندارەكان دەباتەوە بۆ بەغدا، كە لە (٢٨) كوژراو زیاتر نابێت لەوانە تەنها دووانیان كوردن، ئەوانی تریش هەندێكیان عەرەبنو هەندێكیشیان كۆنەكوردنو خۆیان كردووە بە توركمان.

مەلا جەمیل رۆژبەیانی لە سەر ئەم رووداوە وتارێك دەنووسێت بە ناونیشانی (سيدي الزعيم، حسبتك ساهرا، فنمت) هەموو رووداوەكانی تیادا دەنووسێتو ئەو ژمارەیەی رۆژنامەكە بە دزییەوە دەگەیەنێتە مام بەشیرو ئەویش دەیشارێتەوەو دواتر یەكی بە دینارێك دەیفرۆشێت. ئەو كات لە سەر ئەم وتارە رۆژنامەی (صوت الاكراد) دادەخرێت. دوای رووداوەكە رۆژبەیانی كۆمەڵێك لە رۆشنبیرانی كورد رێكدەخاتو سەردانی ماڵە توركمانەكان دەكەن بۆ دڵنەوایكردنو پێیان دەڵێن: كوردو توركمان (٥٠٠) ساڵە لە كەركوكدا پێكەوە دەژینو هیچ گرفتو كێشەیەك نەكەوتووەتە نێوانیانەوەو ئەم كارەساتە كاری نۆكەرانی بێگانەیە.

پاش چەند رۆژێك مەلا جەمیل لە رۆژنامەی (نداء الأهالي) وتارێك ئەنووسێت بە ناونیشانی (كوردو توركمان ٥٠٠ ساڵە لەم شارەدان تا ئێستا ناكۆكی لەنێوانیاندا نەبووە، ئەم كارەساتە روویداوە هی دوژمنانی هەردوو لایە) ئەو كات بەرێوەبەری ئەمنی كەركوك بانگی دەكاتو پێی دەڵێت: ئەم وتارە هی تۆیە؟ مەلا جەمیل دەڵێت: بەڵێ من ئەم وتارەم بۆیە نووسیوە بۆ ئەوەی ناكۆكی نەكەوێتە نێوان كوردو توركمانەوە. پاش چەند رۆژێك پۆلیس دێن لە مزگەوتەوە دەستگیری دەكەنو رەوانەی دادگای دەكەن، لە بەغدا لەوێ كاتێك دادەوەر رۆژنامەكە دەخوێنێتەوە. دەڵێت: زۆر سەیرە بابەتی ناو ئەم رۆژنامەیە داوای دۆستایەتیو رێكی دەكات، نازانم تۆیان بۆچی هێناوە بۆ ئێرە؟ مەلا جەمیل رۆژبەیانی دەڵێت: هەراو پشێوی كەركوك هەمووی ئەم بەرێوەبەری ئەمنە دروستیكردووە، كە منی ناردووەتە ئێرە. دادوەرەكەش دەڵێت: تۆ لای من بێتاوانی، بەڵام بریاری گواستنەوەی تۆی تێدایە بۆ ناسریە، دوای ئەوەی دەینێرنە ناسریە لەوێش دوای دوو هەفتە دەستگیری دەكەنو بۆ ماوەی (١٥) مانگ لە بەندیخانە دەیهێڵنەوە[٢٨].

عەبدولكەریم قاسم لەگەڵ ئەوەی ئەو كودەتایەی لەگەڵ هاورێی عەبدولسەلام عارف، كە پیاوێكی قەومی موتەتەرریف بوو ئەنجامدا، بەڵام وەك خۆی قاسم پیاوێكی نیشتیمانی لایەنگر بە شیوعییەت بوو، بۆیە لە سەرەتادا دەیویست لە كوردو شیوعییەكانەوە نزیك ببێتەوە. شیوعییەكانی بە پاڵپشتی خۆی دەزانی. بریاریدا ماف چارەی خۆنووسین بۆ گەلی كورد لە چوارچێوەی عێراقدا جێبەجێبكاتو بیسەلمێنێت. بۆیە هەر لە سەرەتاوە ئەم

کێشەیەی لە دەستووری کاتیدا چارەسەرکرد، لە مادەی سێی ئەو دەستوورەدا هاتووە: عەرەبو کورد لەم وڵاتەدا هاوبەشن. ئەم دەستوورە مافە نەتەوەییەکانی کوردی لە چوارچێوەی عێراقێکی یەکگرتوو دەسەلماند، بەڵام دواتر قاسم لەم بڕیارەی پەشیمان بووەوە، ئەمەش لە ژێر گوشاری عەرەبە قەومییە توندرەوەکاندا بوو. لە لایەکی ترەوە قاسم ئەوکات خەونی زیادکردنی هێزی دەسەڵاتی لەوەدا دەبینی، کە هیچ مافی نەتەوەیی نەدات بە کورد نەك ئەمە لە ئاییندەدا ببێتە بنەمایەك بۆ جیابوونەوەی کورد لە عێراق. بۆیە بە جێبەجێکردنی ئەم مادەیە قاسم بەردەوام خۆی دەشاردەوەو دوایدەخست تا لە ئاداری (١٩٦٠)دا لە سەر جێبەجێکردنی مادەی سێ لە دەستووری کاتیدا کێشەو ساردی کەوتە نێوان کوردو قاسمەوە. لە هیچ دەستوورێکی عێراقدا ناوی تورکمان وەك نەتەوەیەکی دیار لە عێراقدا نەهاتووە. دەسەڵاتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق بە گشتی تورکمانیان وەك میوانێك لە عێراق دەبینی لە بری ئەوەی وەك هاووڵاتییەکی عێراقیی تەماشا بکرێن.

کورد بۆ جێبەجێکردنی مادەی سێ بە هەموو وردەکارییەکانییەوە گوشاری دەخستە سەر زەعیم، بۆ ئەم مەبەستەش ڕۆژنامەی (خەبات) زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان، هێرشەکانی بۆ سەر دەسەڵاتی قاسم دەستپێکردو بەردەوام داوای هەڵوەشاندنەوەی حوکمی عورفیو لابردنی باری نائاساییو ئازادکردنی زیندانییە سیاسییەکانی دەکرد. بەمەش قاسم زۆر سەغڵەت بوو، گەیشتە ئەو باوەڕەی، کە کورد بەربەستە لە بەردەم دەسەڵاتی تاکرەوییانەی خۆی. بۆیە دەستیکرد بە گرتنو ڕاودوونانی ئەندامەکانیو داخستنی ڕۆژنامەی خەبات. لە ساڵی (١٩٦١)دا کورد ناچار بوو بە دامەزراندنی کیانێکی کوردی سەربەخۆ لە کوردستان. ئەوکات لە تەمووزی ساڵی (١٩٦١)دا ناکۆکییەکانی نێوان قاسمو کورد گەیشتە ئەوپەڕی توندی. بۆیە قاسم سوپای ڕەوانەی ناوچەی کۆبوونەوەی چەکدارەکانی پارتی کرد بۆ لێدانی، بەڵام بارزانی نەیدەویست شەڕی قاسم بکات. بۆیە هەوڵیدا ناکۆکی نێوانیان هێور بکاتەوەو نەهێڵێت بگات بە شەڕی چەکداری. لە (٢٠)ی تەمووزی ساڵی (١٩٦١)دا ڕاپۆرتێك پێشکەش بە قاسم دەکاتو تێیدا پەراوێزخستنی ناوچە کوردییەکان دەخاتەڕوو، داواکارییەك بە سیانزە خاڵ دەخاتە بەر دەست قاسم، لە گرنگترینی ئەو داواکارییانە کشانەوەی هێزەکانی سوپای عێراقو ئەو فەرمانبەرانەبوو، کە ڕۆڵی دیارو خراپیان لە ڕووداوەکانی ئەم دواییەی کەرکوکو کوردستان هەبووەو گەڕاندنەوەی ئەو کادرو فەرمانبەرە کوردانەی، کە لە کوردستان دوورخراونەتەوە بۆ ناوچەکانی تری عێراقو جێبەجێکردنی مادەی سێ بە شێوەیەکی تەواوو بێ کەمیو کورتی. هاوکات بەم بارودۆخەو لە ئاکامی ئەو پێشکەوتنەی بزووتنەوەی سۆشیالیستی لە دونیادا بە دەستیهێنا بە گشتیو پێشکەوتنو فراوانبوونی دەسەڵاتی شیوعییەکان لە عێراق بە تایبەتی. ترسی قاسم لە شیوعییەکان لە ترسی قەومییەکان زیاتر بوو. بۆیە ڕووداوەکەی کەرکوك بیانوویەکی باش بوو بۆ قاسم تا لە شیوعییەکان بدات.

لەنێوان (١٩)ی تەمووزو (١٢)ی ئابی ساڵی (١٩٥٩) بە سەدان شیوعییان دەستگیرکردو توانی بە تەواوی تواناو کاریگەریو هێزی بەرگریی میللی (المقاومة الشعبية)ی شیوعییەکان ئیفلیج بکات. هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا کەوتە کار بۆ هەڵوەشاندنەوەو لاوازکردنی (الشبيبة الديمقراطية) لە پارێزگاکانی عێراقو دەرکردنی زیاتر لە (١٧٠٠٠) ئەفسەری ئیحتیاتی شیوعییەکانو داخستنی یەکێتی سەندیکای کرێکاران. شیوعییەکان ڕۆژ بە ڕۆژ پێگەیان لە دابەزیندا بوو. بە گشتی زستانی ساڵی (١٩٥٩ - ١٩٦٠) بە گرانترین ڕۆژ کەوت لە سەر شیوعییەکان. لە دوای هاوینی ساڵی (١٩٦١)ەوە، دوای هەڵگیرسانی شەڕی دژ بە کورد پێگەی قاسم زۆر لە دابەزیندا بوو، بۆ گەڕاندنەوەی متمانەی خەڵکو گردکردنەوەی پێگەکانی بڕیاری لێخۆشبوونی بۆ سەرجەم بەندکراوە سیاسییەکان دەرکرد. ئەمە جگە لەوەی بۆ ڕاکێشانی سۆزی خەڵك بۆ لای خۆی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ئیمتیازاتی نەوتی لەو ناوچانە وەرگرتەوە، کە لە ژێر چاودێری وەبەرهێنانی نەوتیدا نەبووە، ئەم سیاسەتەی قاسم بە بارێکی تردا واتا لە سەر ئاستی دەرەکی زۆر لە سەری کەوت، تا ئەو ئاقارەی هەندێك گومانی ئەوەیان هەیە قاسم بە تەنیا لە سەر ئەم بڕیارە ڕووخێندرابێت. بە بڕیاردان لە سەر یاسای ژمارە (٨٠) لە (١١)ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٦١)، کۆمپانیا بیانییە نەوتییەکانو وڵاتانی داگیرکەر زۆر سەغڵەت بوون. بۆیە لەمەڕ ئەم بڕیارە وتەیەکی قاسم هەیە، کە لە کاتی داواکردنی مۆرکردن لە سەر بڕیاری ژمارە (٨٠) بە وەزیرەکانی دەڵێت: وەرن ئیمزا لە سەر مەرگی خۆمان بکەین.[٢٩]

هاوکات بۆ سەرقاڵکردنی خەڵکو بنیاتنانی پشتگیری زیاتر بۆ خۆی، قاسم داوای کوەیتی کردو بە بەشێك لە عێراق ناوی برد. بۆیە ئەمەریکاو بەریتانیا هێزەکانی خۆیان لە ناوچەی کەنداو زیاتر بەهێزکردو زیاتر کەوتنە خۆسازدان بۆ ڕووخانی ڕژێمەکەی.

زەعیم بە هەموو شێوەیەك کەوتبووە خۆی بۆ گەڕاندنەوەی متمانەی جەماوەری خۆیو لاوازکردنی دوژمنانی لە نێو گەلدا، بۆیە ئەو گوشارەی، کە پێشتر کردبوویە سەر دەرەبەگو دەوڵەمەندان لە ساڵی (١٩٥٨) بە یاسای چاکسازیی کشتوکاڵی (قانون الإصلاح الزراعي) لە ڕێگای بەرزکردنەوەی زۆری باج لە سەر دەوڵەمەندو خاوەن موڵکەکان، کە تا (٣٠)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٥٩) گەیاندییە بەرزترین ئاست. لە دوای ئەم ڕووداوانەوە زۆر کەمی کردەوەو کەوتە موجامەلەی دەرەبەگو خاوەن موڵکو دەوڵەمەندەکان، کە بەشێکی زۆریان تا ئەو کاتە کەوتبوونە ئێرانەوەو سەرقاڵی خۆئامادەکردن بوون بۆ دژایەتی زەعیمو دانانی پلان بۆ ڕووخانی ڕژێمەکەی. لەگەڵ هەموو ئەو ناکۆکییانەی کەوتبووە نێوان قاسمو شیوعییەکان تا ئاياری ساڵی (١٩٦٢) ئاگربەستی نێوان قاسمو شیوعییەکان هەر مابوو. بارودۆخەکە نەگەیشتبووە ئێسك شکاندنی یەکتر، بەڵام لەو مێژووە بە دواوە بە هۆی ئەو خۆپیشاندانە

مەزنەی، كە شیوعییەكان ئەنجامیانداو داوای ئاشتییان كرد لە زەعیم، كە ئاشتی لەگەڵ كورددا ئەنجام بدات. قاسم بەم داوایە زۆر سەغڵەت بوو. كەوتە دەستگیركردن‌و ڕاودوونانی شیوعییەكان‌و بە سەدان كەسی لێ بەندكرد. بەمەش شیوعییەكان هیچ هیوایەكیان بە زەعیم‌و ڕژێمی كۆماری نەما. لە (٨)ی تەمووزی ساڵی (١٩٦٢)دا حیزبی شیوعی بەیانێك دەردەكات‌و حكومەتەكەی زەعیم بە دەوڵەتێكی پۆلیسی‌و دیكتاتۆری ناوزەد دەكات[٣٠]، بەوەی شەڕو ناكۆكی نێوان قەومییەت‌و شیوعییەت یەكێك لە سیما دیارەكانی ئەو سەردەمە بوو. بۆیە ڕەنگدانەوەی ئەم شەڕو ناكۆكییە لە زۆربەی وڵاتاندا ڕەنگی دابووەوە، ئەو كات یەكێتی سۆڤێت بە چاوگی شیوعییەت‌و سۆشیالیزم دەزانرا. ئەمەریكاو جەمسەری سەرمایەرداری ببوون بە پاڵپشت‌و پەنای بزووتنەوە قەومییەكان لە دژی ویستی فراوانخوزای شیوعییەتدا.

لە وڵاتی میسر، كە لە فەرهەنگی سیاسیدا بە خاڵی چەق دادەنرێت، لە ناوچەی عەرەبی‌و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست‌و گرنگییەكی زۆری هەیە. جەمال عەبدولناسر، كە پیاوێكی نەتەوەیی‌و دژ بە شیوعییەت بوو، توانی جڵەوی دەسەڵات بگرێتەدەست. ئەو هەر زوو دەستپێشخەری كردو گورزێكی بەهێزی لە (٢٣)ی كانوونی یەكەمی ساڵی (١٩٥٨)دا لە شیوعییەكانداو دەنگی ئەوەی بەرزكردەوە، كە لە كۆی ناسرییەكان سەنگیان هەبێت دەبێت شیوعییەت نەمێنێت. دواتر شاڵاوی گرتن‌و كوشتنی شیوعییەكان لە میسرەوە پەرییەوە بۆ سوریاو بە دەیانیان لێ كوژراو زیندانیكران، بەڵام وەك عێراق، كە بە دڵی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەناسرێت گرنگی ئابووری‌و سیاسی‌و جوگرافیی زۆری هەیە. شەڕی نەتەوەییەكان‌و شیوعییەكان گەیشتە ترسناكترین ئاست‌و تاڵترین ئاكامی هەبوو. زەعیم عەبدولكەریم قاسم بەوەی پیاوێكی نیشتیمانی‌و مەیلی بە شیوعییەت بوو. شیوعییەكان توانیان ڕۆڵێكی دیاریان هەبێت لە ماوەی حوكمیدا. هاوكات دژایەتیكردنی قاسم لەلایەن جەمال عەبدولناسرەوە، كە بە كودەتایەك لە ڕێگای شەواف‌و هاوڕێكانییەوە دەستیپێكردو ئاشكرا بوو. شیوعییەكانی لە ڕەشەبای ئەو ترس‌و كودەتایە بە ئاگا هێنا، كە لە سوریاو میسرەوە بۆیان ئامادە دەكرا. ئەمە بوو وایكردبوو شیوعییەكان ڕقێكی زۆر لە نەتەوەییە توندڕەوەكان‌و بەعسییەكان هەڵگرن. ئەمەش لە سەرەتادا بە قازانجی شیوعییەكان گەڕایەوە، بەڵام لە كۆتاییدا قاسم هاوسەنگییەكەی لێ تێكچوو، نەیدەزانی جیاوازی لەنێوان گورگ‌و مەڕدا بكات. وای لێهات لە شیوعییەكان دەترساو بە ترسی ڕاستەقینەی دەزانی، بەڵام بەعسییەكانی بە كارەكتەرێكی لاوازو بێ شەعبیەت‌و بێ بنەما دەزانی‌و باوەڕی نە دەكرد بتوانن لە دژی ئەم بووەستنەوە. بۆیە هەوڵی بەعسییەكان بۆ كوشتنی بە هەوڵێكی بێ ئومێدی‌و بەڵگەی لاوازی دوژمنانی دەزانی. چەند ئاماژەیەكیشی لا دروست ببوو بۆ ڕاستكردنەوەو ساغكردنەوەی ئەم قەناعەتەی، لەوانە دروستبوونی لێكترازان لەنێوان بەعسییەكانداو ڕاكردنی فوئاد ئەلركابی لە (١٩٦١)دا، كە ئەمین سری بەعس بوو بۆ لای عەبدولناسر. لەم بارودۆخەدا نەتەوەییە توندڕەوەكان‌و بەعسییەكان توانیان ئەم هەلە بقۆزنەوەو دەستی خۆیان بوەشێنن‌و خۆیان سازو ئامادە بكەن بۆ لێدانی زەعیم‌و ڕووخانی ڕژێمەكەی. بارودۆخی ئەو كاتەی عێراق‌و پێكهاتەی هەمەجۆری پیاوێكی دەویست زۆر ووردبینانە عێراق بخوێنێتەوەو بزانێت چۆن هاوسەنگی لەنێوان ئەو هەموو نێوان دژیانەدا دروستدەكات. دەشێت هۆكاری ڕووخانی ڕژێمەكەی قاسم هەر ئەوە نەبێت، كە زەعیم نەیتوانی هاوسەنگی ڕابگرێت‌و حساباتەكانی بە هەڵە ئەژماركردبێت، بەڵكو پێكهاتەی عێراق بۆ خۆی هۆكارێكەو مێژووی خوێناوی شەڕ لە سەر دەسەڵات‌و شەڕی تایفەگەری‌و نەتەوایەتی‌و ئاینیی‌و مەزهەبی هۆكارێكی تر بێت.

دكتۆر عەلی وەردی زانای كۆمەڵناسی بەناوبانگی عێراقی، زۆر بە ووردی‌و بە ڕوونی باس لە پێكهاتەو سروشتی كەسایەتی عێراق‌و شەڕانگێزی تایفەكانی دەكات. بۆیە ئەمەش بۆ خودی زەعیم كارەساتێكی تر بوو، نەیدەزانی چۆن مامەڵە لەگەڵ پێكهاتە جیاوازەكانی عێراقدا بكات. زەعیم لە سنووری دەسەڵاتیدا كۆمەڵێك ئامانجی ناكۆكی لە خۆی كۆكردبۆوەو نەیدەویست لە ڕێگای لێدانی فەرمانگە داگیركەرەكانەوە، كە ئەوكات لە هاوپەیمانی باكووری ئەتڵەسی‌و هەردوو ئیدارەی ئەمەریكیی‌و ئینگلیزو كۆمپانیای نەوتی عێراقدا چڕبووبوەوە، خۆی لە یەكێتی سۆڤیەت نزیك بكاتەوەو هاوپەیمانی لەگەڵدا بەهێز بكات. ئەمە جگە لەوەی بۆ دژایەتیكردنی نەتەوەییە توندڕەوەكانی عەرەب‌و بەعسییەكان‌و هاوكات زیاتر ڕاكێشانی سۆزی یەكێتی سۆڤێت‌و وڵاتە شیوعییەكان ڕێگای بە حیزبی شیوعی دەدا ڕۆڵێكی دیارو كاریگەرییان لە عێراقدا هەبێت. بە واتایەكی تر زەعیم دەیویست لەنێوان هەردوو نەهەنگی سۆشیالستی‌و سەرمایەداریدا مەلە بكات ئەمەش بۆ ئەو سەردەمە بە واتای سیاسی هەوڵێكی خۆكوژی بوو، بەڵام ئەو دركی پێنەدەكرد. زەعیم لە ڕێگای دانانی بڕیاری چاكسازیی كشتوكاڵی‌و دانانی باجی زۆر لە سەر دەوڵەمەندو خاوەن موڵكەكان‌و ئەو پشتگیری‌و یارمەتییەی هەژاران‌و نەداران‌و داواكردنەوەی كویت‌و ڕاگەیاندنی بڕیاری (٨٠). بۆ گەڕانەوەی بەشێكی سامانی نەوتی عێراق بۆ ژێر دەستی عێراقییەكان، ئامانجی فراوانكردن‌و بەهێزكردنی پێگەی جەماوەری ناوخۆ بۆ خۆیی‌و حكومەتەكەی ئەنجام دەدا، بەڵام ئەم داوایانە هەندێكیان بۆ قاسم بە پێچەوانەی بەرژەوەندییەكانییەوە گەڕانەوە. بە داواكردنی كوێت، ئەمەریكاو ئینگلیز ڕێگایان بۆ خۆشبوو بۆ ئەوەی زیاتر بێنە ناوچەی كەنداو و هێزە سەربازییەكانیان لەو ناوچەیە چڕ بكەن بۆ هەر شەڕێكی لە ناكاو، هەروەها لەكەداركردنی زەعیم بە بەرژەوەندییەكانی دوژمنانی‌و ڕاگەیاندنی بڕیاری (٨٠)، كە بە پێی ئەم مادەیە (٩٠٪)ی ناوچەی وەبەرهێنانی نەوتی دەگەڕایەوە بۆ حكومەتی عێراق زیانێكی زۆر گەورە بوو لە بازاڕی دارایی‌و نەوتی جیهانی نەدەكرا. زەعیم بە بێ سزا لێی دەرباز بوو. حەسەن عەلەوی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: سەیید مورتەزا عەسكەری لە لەندەن لە (٣٠)ی حوزەیرانی

ساڵی (١٩٩٠)دا ئەو کات تەمەنی هەشتاو حەوت ساڵ بوو بۆی گێرامەوە یەکێك لە وەزیرەکانی زەعیم پێی ووتم کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیرانی تایبەت بە گفتوگۆ لە سەر بڕیاردان لە سەر یاسای نەوتی ژمارە (٨٠)، ووتی: وەرن مۆر لە سەر بڕیاری لە سێدارادانی خۆمان بکەین. ئەو ئیمزای کردو ئێمەش بە دوایدا[٣١]، بە واتا زەعیم درکی بە ترسناکی ئاکامی بەو بڕیارە کردبوو. زەعیم دەیویست لە ڕێگای لێدانی شۆڕشی کوردو نەدانی مافی نەتەوەییو جێبەجێکردنی مادەی سێ لە دەستووری کاتیو هاوکات یارمەتیدانی هەندێك وڵاتی عەرەبیو پشتگیری لە کێشەی فەلەستین بوونی خۆی لە بازنەی نەتەوەی عەرەبی بسەلمێنێتو پێگەیەك بۆ خۆی دروستبکات.

هەموو ئەمانە چەندێك سوودیان بۆ زەعیم هەبوو. بە بارێکی تردا بوونە فاکتەری بە هێزو چالاك بۆ ڕووخانیو دابینکردنی هەلی ئالتوونیی بۆ بەعسییەکانو عەرەبە نەتەوەییە شۆڤێنیستەکان تا زەعیمو حکومەتەکەی پێ لەناوبەرن.

*** بەشی یازدە: (٨)ی شوبات سەرەتای دەستپێکردنی نەهامەتییەکان:**

لە (٨)ی شوباتی ساڵی (١٩٦٣)دا بەرەی نەتەوەیی، کە پێکهاتبوون لە نەتەوەییەکانو بەعسییەکان بە سەرۆکایەتی موشیر عەبدولسەلام عارف بە کودەتایەك کۆتاییان بە دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم هێنا، هەر ئەو کات ڕاستەوخۆ دادگایەکی سەربازییان دامەزراندو بە خێرایی دادگاییەکی کارتۆنی زەعیمیان کردو گوللە بارانیان کرد. بارودۆخەکە زۆر ناسك بوو بۆ کودەتاچییەکانو هیچ دواخستنێکی نەدەگرتەخۆ، چونکە قاسم لە ماوەی دەسەڵاتیدا توانیبووی سۆزی بەشێکی بەرفراوان لە خەڵك بۆ خۆی وەربگرێت. بەعسییەکان بەمەبەستی کوشتنی هەر هەوڵێکی خەڵك بۆ گەڕانەوەی قاسم زۆر بە خێرایی گوللە بارانکرا. لەم گۆڕانکارییانەدا عەبدولسەلام عارف، کە نوێنەری تەیاری هاوپەیمانی نەتەوەیی بوو، بوو بە سەرۆك کۆماری عێراقو ئەحمەد حەسەن بەکری نوێنەری ڕەوتی بەعسییە نەتەوەییەکان بوو بە سەرۆك وەزیران. لە کۆتایی ئەم سەردەمەدا قاسمو ناسر هەردووکیان مردن، ناسر بە میراتی بۆ خێزانەکەی تەنها (٦١) جونەهیی جێهێشتو قاسمیش تەنها مووچەی مانگانەکەی، کە لە چەند دینارێك زیاتر نەبوو لە گیرفانیدا بە میراتی مایەوە بۆ کەسو کارەکەی.

بە بۆنەی ڕووخانی ڕژێمەکەی قاسمەوە تورکمانەکان بە چەندین جۆر خۆشییو شادی خۆیان دەربڕی. لە ئاداری ساڵی (١٩٦٣)دا لە دوای یەك مانگ لە کودەتاکە گەورەترین کۆبوونەوەو ڕێپێوانیان ئەنجامدا. ئەمەش لە لایەك بۆ دەربڕینی خۆشییو شادی خۆیان بە ڕووخانی قاسمو لە لایەکی تر بۆ پاڵپشتی کودەتاچییەکانی بەعسو نەتەوەییە توندڕەوەکان. لە دوای چەند مانگێك تورکمانەکان بەمەبەستی کۆکردنەوەی بەرهەمی ئەو پێشوازییەی، کە لە کودەتاچییەکان کردیان، وەفدێکیان سەردانی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی شۆڕشیان لە بەغداد ئەنجامداو داوایان لە حکومەتی نوێ کرد هاوبەشیان بکەنەوە لە دەسەڵات. ئەگەر بە تەنها یەك وەزارەتیش بێتو ئەو وەزارەتەش وەزارەتی ئاوەڕوو تەندروستی بێت.

لە سەرەتای ئەم قۆناغەدا توێژو کەسایەتییە تورکمانەکان چەندین چالاکییو جموجوڵیان دەستپێکرد. لەوانە کۆمەڵێك خوێندکاری تورکمانی بەرەی نیشتیمانیو ڕێکخراوی خوێندکارانی عەرەبی، ئەم داوایانەی تورکمان جێگای نیگەرانکردنی دەسەڵاتی نوێ بوو، بەڵام نەیاندەویست ڕاستەوخۆو بە ئاشکرا نارەزایی خۆیان دەربڕن. هاوپەیمانی نێوان بەعسییەکانو عارفییەکانو لایەنگرانی جەمال عەبدول ناسر هاوپەیمانێکی سراتیجی نەبوو، بەڵکو هاوپەیمانێتییەکی تەکتیکیی کاتی بوو. هەر لایەنێك لەوانە لە سێبەری ئەو هاوپەیمانییەدا دەیویست ئەوی تر لە ناوبەرێتو بە تەنها لە سەر کورسی دەسەڵات دابنیشێت.

لەلایەن بەعسییەکانەوە شێوازی کارکردنیان زیاد لەوەی جەماوەری بێت بە ڕێگای کوشتنو کودەتا دەستپێکرد، هەر ئەوکات میلیشیایەکی چەکدارییان دروستکرد بە ناوی پاسەوانی نەتەوەیی (الحرس القومي). ئەم چەکدارانە لەوپەڕی دڕندایەتیو خوێنمژیندا بوونو هەر لە سەرەتای دروستبوونییانەوە بوون بە دوو باڵ. باڵی نهێنیو باڵی ئاشکرا. ئەم سیاسەتە تا دواهەناسەی ڕووخانی ڕژێمی بەعس لە عێراقدا کاری لەسەر دەکرد. بە شێوەیەکی گشتی کاری ئەم میلیشیایانە بە هەردوو باڵەکەیەوە (ئاشکراو نهێنی) لە ژێر چەتری بەرگری لە نیشتیمانو نەتەوەی عەرەبی کوشتنو لەسێدارەدانی خەڵك.

سەرەتا بەعسییەکان بە کوشتنو لەسێدارەدانی شیوعییەکانو لایەنگرانی قاسم دەستیان پێکردو دواتر کەوتنە کوشتوبڕکردنی کوردو هەموو ئەوانەی خۆشیان بە چارەی ڕژێمی نوێدا نەدەهات. لە پاڵ ئەمەشدا بەعسییەکان سیاسەتێکی تریان پەیڕەوکرد بۆ سەرکوتکردنی نەیارانو گەلانی عێراقو دوای کوشتوبڕکردنیان دەکەوتنە تاڵانکردنی ماڵو موڵکیان، ئەم کردەوانەی بەعسییەکان بیانوویەکی دا بە دەستەوە بۆ ئەوەی عارفو هەوادارانی بە پاڵپشتی ناسرییەکان، کە بە (بەرەی نەتەوەیی – الجبهة القومية) ناسرابوون بکەونە لێدانی بەعسییەکان. لە (١٨) نۆڤەمبەری ساڵی (١٩٦٣) عەبدولسەلام عارف بڕیاریدا بە بەندکردنی بەعسییەکانو هەوادارانیان تا ئەحمەد حەسەن بەکریشی کردە بەندیخانەی سەربازییەوە.

لە (٢٠) نۆڤەمبەری ساڵی (١٩٦٣) حکومەتێکی نوێی دامەزراندو کۆمەڵێك لە ئەفسەرە بەعسییە میانڕەوەکانیشی گرتەخۆی لەگەڵ ناسرییەکانو بێلایەنەکاندا. عەبدولسەلام بۆ ماوەی نۆ مانگ لە سەر کورسی دەسەڵات مایەوە. مێژووی ستراتیجی بیرکردنەوەی عارف دەگەڕایەوە بۆ سەرەتای کودەتاکەی (١٤) تەمووز ئەو کاتە لەگەڵ قاسمدا بە هاوبەشی دەسەڵاتیان گرتەدەست.

عارف هەر لە سەرەتاوە ئەو گەمەیەی دەستپێکرد، کە لە سەر بنەمای ویستەکانی خۆیو تەماعەکانی بۆ دەسەڵات

کار بکات. ئەوکات لە پشت قاسمەوە دەستپێشخەری یەکگرتنی لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوودا کردبوو. لە (١٨)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨) ئەو کات چاوی بە ناسر دەکەوێتو باسی هەڵوێستی خۆی بۆ دەکات، بەڵام ناسر پێشنیاری ئەوە دەکات، کە ئەم دەستپێشخەرییەی دوا بخات تا زەمینەی بۆ دەخوڵقێنێت. عارف لە سەر رۆشنایىو رێنماییەکانی ناسر، دوای گەراندنەوەی بۆ بەغداد لێدوانێك دەداتو باس لە پەیوەندیی نێوان کۆماری عەرەبی یەکگرتوو - عێراق دەکاتو دەڵێت: ئەم یەکگرتنە لە سەر بنەمای یەك ئامانجییو یەکێتیی گەلە، [٣٢]، بەڵام عارف لە سەرجەم لێدوانەکانیدا هیچی لە سەر یەکگرتنی عێراقو کۆماری یەکگرتووی عەرەبی (میسر - سوریا) نەدەکرد، بەڵام گەشتێکی بە سەرجەم پارێزگاکانی عێراقدا دەستپێکردو لە هەموو لێدوانە جەماوەرییەکاندا خەڵکێکی زۆر هاوسۆزی رژێمی کۆماری بوون، کۆدەبوونەوەو ئەمیش لە ووتارەکانیدا بە زۆری ناوی جەمال عەبدولناسرو کۆماری یەکگرتووی عەرەبی دەهێناو وەك دۆستێكو پشتیوانێك باسی لێوەدەکردو ناوی ناسری دەبەست بە ووشەی برا دڵسۆزو برای گەورەو رزگارکەری مەزنو پاڵەوانی رزگاری گەلی عەرەبی.. هتد. لە هەمان کاتدا عارف بۆ قایمکردنی جێ پێی خۆی وورده وورده لە بەعسییەکان نزیك دەبووەوە، ئەو کات بەعسییەکان هیچ سەنگێکی ئەوتۆیان نەبوو، بەڵام عارف نەیدەویست جگە لە قاسمو شیوعییەکان دژایەتی کەسی تر بکات. هاوکات بە بارێکی تردا لەبەر ئەوەی بەعسییەکانیش دروشمی رزگاریی نەتەوەی عەرەبییان لە داگیرکەرو کۆمۆنیستەکان هەڵگرتبوو. بۆ عارف لە قاسمو شیوعییەکان نزیکتربوون. ئەم سیاسەتەی عارف زۆر قاسمی نیگەران دەکرد، بەڵام قاسم نەیدەویست هیچ هەنگاوێکی لاوەکی بۆ تەمێکردنی بنێت، بۆیە رێگای بۆ خۆشکرد تا زیاتر ویستە شاراوەکانی دەربکەوێت.

لە (٥)ی ئابدا عەبدولسەلام عارف بە ئاوازێکی تر، کە زۆر لە ئاوازە کۆنەکەی فراوانترو روونتر بوو بۆ داواکردن لە یەکگرتنی لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو لە (١٧)ی ئابدا زۆر بە رووتترو وورددتر لە لێداوانەکانیدا ویستە شاراوەکانی خستەڕوو، بە ئاشکرا ووتی: کۆماری عێراق بەشێکی دانەبراوە لە نەتەوەی عەرەبیو نەتەوەی عەرەب یەك گەلە. بە شێوەیەکی گشتی ژیانی سیاسیی عارف بە سێ قۆناغی یەك لە دوای یەکدا تێپەری، کە لە (١٨)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٦٣)ەوە دەستپێکرد تا (٣١)ی نیسانی ساڵی (١٩٦٦).

*** قۆناغی یەکەم:**

قۆناغی دروستکردنی هاوپەیمانیو بەستنی رێککەوتننامەیەك بوو لەنێوان عارفییەکانو بەعسییە سەربازییەکانو ناسرییەکان. لەم قۆناغەدا باڵ باڵی عارفییەکان بە سەرۆکایەتی عەبدولسەلام عارف بوو، بەڵام بەعسییەکان بە سەرۆکایەتی ئەفسەری بەعسیی حەردان تکریتیی بوو. لەگەڵ چەند کەسێکی تر لەوانە تاهیر یەحیاو ئەحمەد حەسەن بەکر. ناسرییەکان بە فەرماندەیی زەعیم محەمەد مەجیدو زعیم عەبدولکەریم فەرحان بوو. ئەم سێ لایەنە لەسەر بنەمای ململانێی یەکتر دروستبوون، نەك تەواوکەری یەکتر، بۆیە هەریەکەیان بەردەوام لە هەوڵی لێدانو رووخانی ئەوانی تردا بوون.

*** قۆناغی دووەم:**

ئەم قۆناغە بە کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتی بەعسییەکان لە حکومەت دەستپێکرد. عارف لە دوای لێدانی بەعسییەکانو گرتنی رابەرەکانیان رێگای بۆ ناسرییەکان خۆشکرد بە ئازادیی زیاتر هەڵسوکەوت بکەنو زۆر جێگاو پلەی گرنگ بگرنەدەست. ئەمەش رێگای بۆ ناسرییەکان خۆشکرد خۆیان بۆ لێدانی عارف ئامادە بکەن.

*** قۆناغی سێیەم:**

ژیانی عارف بە هەوڵی ناسرییەکان، بە گرتنەدەستی دەسەڵات لە عێراقدا دەستپێدەکات. لە (١٥)ی ئەیلوولدا ناسرییەکان هەوڵی ئەنجامدانی کودەتایەك بەسەر عارفدا دەدەنو ئەوە بە هەل وەردەگرن لە کودەتاکەیان، کە عارف سەردانی لوتکەی عەرەبی (الدار البيضاء) دەکات. بە تائیبەك جێ دەهێڵێت، بەڵام عەقید سەعید سەلیبی، کە فەرماندەی هێزەکانی پاراستنی بەغداد بوو (کەسێکی زۆر نزیك بوو لە عارف) فریای دەکەوێتو شکست بە کودەتاکەیان دەهێنێتو لێدانێکی بەهێز لە ئەفسەرە باڵاکانو سەرەکییەکانی ناسرییەکان دەدات. لە راستیدا ئەمە یەکێك لەو هۆکارانە بوو وای لە سەدام حسێن کردبوو، کە هیچ کات کورسی دەسەڵاتو بەغدا بەجێنەهێڵێت، چونکە ئەم سیاسەتە باو بوو لە ئەنجامدانی کودەتا بەم شێوەیە، لە جارێکدا، کە ئەحمەد حەسەن بەکر سەفەر دەکات بۆ دەرەوەی وڵات، لە گەرانەوەیدا سەدام دەیەوێت کودەتای لێبکات. بۆیە رێگا نادات بەو ئەفسەرانەی، کە نزیکبوون لە ئەحمەد حەسەن بەکرەوە بچنە پێشوازی، خۆیان بە سوپاکەیانەوە لەوانە ئەفسەری باڵا سەعدون غیدان، کە بە یەکێك لە نزیکترین ئەو کەسانە دادەنرێت پشتیوانی لە ئەحمەد حەسەن بەکر کردووە، ئەحمەد حەسەن بەکر، کە دەگاتە فرۆکەخانەی بەغدادو تەماشا دەکات ئەو ئەفسەرانە لە پێشوازیدا نین. لە فرۆکەکە دانابەزێتو داوادەکات بە ئامادەبوونیانو دوای هاتنیان دێتەخوارەوە، لە دوای کوشتنی لەلایەن سەدامەوە لە ساڵی (١٩٧٩) سەدام سەعدون غەیدانیش دەرمانخوارد دەکاتو دەیکوژێت.

*** بەشی دوانزە: گەڕانەوەی کورد بۆ شاخ:**

سالّی (١٩٦٣) سەرەتای دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێ بوو لە ژیانی خەباتی ڕزگاریخوازیی گەلی کورد، لەم سالەدا سەربازگەی مەشقی پێشمەرگە لە ئێران و ناوچە سنوورییەکانی کوردستانی عێراق بەدەرکەوت. لەم کاتەدا دەسەلاتی عێراق ڕووی لە هاوپەیمانانی لەگەلّ ولاتە عەرەبییەکان کرد بۆ دژایەتیکردنی کوردو کێشەی نەتەوایەتی نێوان کوردو عەرەب. دەسەلاتی عەبدولسەلام عارف ڕووبەڕووی چەندین گرفت و کێشە بووەوەو نەیدەتوانی بەرگەی ئەو هەموو نەیارانە بگرێت. بۆیە چاکترین ڕێگا بۆ ڕزگاربوون لەو قەیرانانە ڕوویکردە ولاتی میسرو سوریا، بە دەستپێشخەرییەك داوای یەککگرتنی لێکردن. لە نیسانی سالّی (١٩٦٣)دا ئەم پرۆژەیە لەلایەن هەر سێ ولاتەوە بریاری لە سەر دراو سەرۆکەکانی هەر سێ لا ئیمزایان لە سەر کرد. لە (٨)ی نیسانی سالّی (١٩٦٤)دا تورکمانەکان لە ڕێگای (یانەی برایەتی تورکمان)ەوە ڕاپۆرتێکیان دایە سەرۆك عارف و تێیدا باسیان لە داواکارییەکانی تورکمان کرد. بە تایبەتی بەشداریکردنیان لە ژیانی سیاسیی نیشتیمانی عێراق. ڕاپۆرتەکە ئاماژە بەوە دەکات، کە لە عێراقدا ژمارەی تورکمان بە (٥٠٠) هەزار هاوولاتی مەزەندە دەکرێت و دەلێت: ناوچەی جێنیشینیان لە ماوەی نێوان ناوچەکانی کوردو عەرەبدایە، هەروەها لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە، کە دەلێت: بەرێز سەرۆك تورکمان لە عێراقدا هیچیان ناوێت جگە لە دانپێدانان بە بوونیان وەك یەکێك لە نەتەوە سەرەکییەکانی عێراق،[٣٣]، بەلام دەسەلاتی عارف ئەم داواییەی تورکمان بە نارەوا دەزانێت و تورکمان بە ژمارەیەکی زۆر کەم لە قەلەم دەدات. بۆ دەمکوتکردنی تورکمانەکان لە (٢٩)ی نیسانی سالّی (١٩٦٤) دا حکومەت دەستوورێکی کاتی ڕادەگەیەنێت و لە یەکێك لە برگەکانیدا بە ڕوونی و بێ پێچ و پەنا دەلێت: عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب و ئامانجی یەککگرتنی تەواوی نەتەوەی عەرەبە. لە (١٦)ی نیسانی سالّی (١٩٦٦) لە دوای ئەوەی عەبدولسەلام بە ڕووداوی فڕۆکە بە شێوەیەکی تەمومژاوی دەکوژرێت، عەبدولڕەحمان عارف برای دوای مشتومڕێکی زۆر دەچێتە جێگایی و بەردەوام دەبێت لە سەر هەمان ڕێبازی ئەو، بەلام عەبدولڕەحمان عارف لە سەر ئەوەی پیاوێکی لاواز دەبێت لە دەسەلات و سیاسەت، دەبێتە جێگای گالتەجاری سیاسەتمەداران و فەرماندە سەربازییەکان. لە مانگی ئایاری سالّی (١٩٦٦)دا جارێکی تر تورکمانەکان لە ڕێگای وەفدێکیانەوە خۆیان دەگەیەننە سەرۆکی نوێ لە کۆشکی کۆماری لە پاڵ پیرۆزبایی بە گرتنەدەستی دەسەلات و دەربڕینی باوەڕی لایەنگری خۆیان بۆ سەرۆك و حکومەتی نوێ، داوای داننانی حکومەت بە مافە ڕۆشنبیرییەکانی تورکمان دەکەن، بەلام سەرۆکی نوێش هیچ سەنگێك بۆ ئەم داوایانەی تورکمانەکان دانانێت و وەلامیشیان ناداتەوە.

سەردەمی دوای قاسم بارودۆخەکە زۆر بە خراپی بە سەر تورکمانەکاندا شکایەوە. لە سەردەمی هەردوو عارفدا بارودۆخی تورکمان هەندێك هێمنی بەرچاوی بە خۆوە بینی، بەلام تورکمانەکان نەیانتوانی هیچ دەستکەوتێك لەم ماوەیەدا بۆ خۆیان بەدەستبهێنن. بۆیە دواتر ئەم بارودۆخە زۆر بە خراپی بە سەر تورکماندا شکایەوە. لە سەردەمی بەعسدا ژمارەیەك لە ئەفسەری تورکمان بەشداری کودەتاکەی بەعسیان کرد، لە هەمان کاتدا لایەنی مەدەنی تورکمانیش لە ڕێگای ڕێپێوان و ڕێکخستنی ئاهەنگو شادی، پشتیوانی خۆیان بۆ بەعسییەکان خستەڕوو، تورکمانەکان لە شاری کەرکوك ڕێپێوانێکی زۆر فراوانیان ئەنجامداو تێیدا جگە لە ستایشی بەعسییەکان دژایەتی خۆیان بۆ کوردیش دەربڕی و شاندێکیان بە قەبارەی زیاتر لە دوو هەزار کەس پێکهێناو هەناردەی بەغدادیان کرد بۆ بەشداریکردن لە ڕێپێوان و پشتگیری کودەتاکە، ئەمە لە دوای یەك مانگ لە ئەنجامدانی کودەتاکە، بەلام هەموو ئەمانە هیچ سوودێکیان بۆ تورکمان نەبوو. بگرە ڕۆژ بە ڕۆژ بارودۆخی تورکمان وەك سەرجەم گەلانی تری عێراق ڕووەو خراپتر دەڕۆیشت و بەعسییەکان زیاتر سیمای خوێناوی دڕندانەیان دەردەکەوت. لەگەلّ ئەوەی ڕژێمەکەی عارف نییەتی بەرانبەر بە کورد باش نەبوو، بەلام نەیدەویست هەر لە سەرەتاوە شەڕی کورد بکات. بۆیە سیاسەتی دواخستنی چارەسەرکردنی کێشەی کوردی بەرپاکرد. ئەمەش سیاسەتێکی زۆر ئاشکرای ڕژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عێراقە، هەر لە سەرەتای دامەزراندنی عێراقەوە، بەردەوام هەر کەسێك هاتبێتە سەر کورسی دەسەلات سەرەتا کۆمەلێك پەیمان و گفتی بە کورد داوە تا جێگەی خۆی قایم کردووەو سوپاو دەزگا ئەمنییەکانی دروستکردووەتەوەو دواتر کەوتووەتە لێدان و کوشتوبڕکردنی کورد. سیاسەتمەدارانی کوردیش زۆر بە ساویلکەیی ئەم تەلەیەیان بە سەردا تێپەڕیووە. لە کۆتاییدا هیچی بۆ نەماوەتەوەو ڕایکردووەتەوە شاخ و شۆڕشی پارتیزانی دەستپێکردووەتەوە. عەبدولسەلام عارف لە یەکەم بەیانی کودەتاکەیدا ئاماژە بە یەکێتی گەلانی عێراق و برایەتی کوردو عەرەب دەکات. بە شێوەیەك، کە لە بەرژەوەندی هەردوو نەتەوەدا بێت. عارف وەك سەرجەم سەرکردە عەرەبە شۆڤێنییەکانی تر پەیمانەکانی لە سەرەتاوە بە تەمومژاوی خستەڕوو، بەلام پارتی دیموکراتی کوردستان وەلامی پەیامەکەی عارفی دایەوەو بە ڕەزامەندی و نامەیەکی پشتگیری بۆ ئەنجومەنی سەرکردایەتی کوتادەی نوێ ناردو تیایدا ئاماژەی بەوەکرد گەلی کورد چاوەڕوانی فەرمانڕەواو سەرکردە نوێکانی عێراقە، کە هێلەکانی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە سەر بنەمای ئۆتۆنۆمی دیاری بکەن. لە ڕۆژی دواتریش بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ وەك دەربڕینی نییەتپاکیی کوردو وەستانی شەڕی لە سەرجەم بەرەکاندا ڕاگەیاندو لە (١٩)ی شوباتی سالّی (١٩٦٣)دا تالەبانی وەك نوێنەری تایبەتی بارزانی گەیشتە بەغدا بەمەبەستی ئەنجامدانی دانوستانی ئاشتبوونەوە. هاوکات ئەوەی، کە حکومەتی نوێ دەبێت بە شێوەیەکی ڕوون و بێ پێچ و پەنا ئەنجامی بدات داننان بوو بە مافەکانی کوردو بەخشینی ئۆتۆنۆمی و دوا وادەش بۆ ئەمە (١)ی ئاداری سالّی (١٩٦٣)

دیاریکرا.

حکومەتی ناوەندی ئەوکات بە شێوەیەکی سەرزارەکی لە سەر ئەم داوایەی کورد رازیبوو، دەستبەجێ حکومەت پرۆژەیەکی ئامادەکرد، کە تێیدا عێراق دەکات بە شەش پارێزگاوە، کە یەکێکیان پارێزگای سلێمانی بوو لە ویلایەتەکانی هەولێرو سلێمانیو دهۆك پێکهاتبوو. ئەمەش بە واتای ئەوە دەهات، کە حکومەتی نوێش کەرکوکی لە ناوچەی کوردی دەرهێنابوو. بۆیە بارزانی پرۆژەکەی زۆر بە توندی رەتکردەوەو سێ داوای سەرەکی خستە بەردەم حکومەت، وەك مەرجی ئاشتیو پێکەوە ژیان:

١. دامەزراندنی سوپایەکی کوردی، کە جێگای یەکەکانی پۆلیسو سوپای عێراقی لە کوردستان بگرێتەوە.

٢. دیاریکردنی برێك لە داهاتی نەوت بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردی.

٣. ناوچەی کوردستان دەبێت هەردوو لیوای موسڵو کەرکوك بگرێتە خۆی.

ئەم داوایانەی بارزانی لای دەسەڵاتی عێراق قبووڵ نەبوو. هاوکات نەشیاندەویست لەو کاتەدا، کە ئەوان لە لاوازیدا بوون شەڕی کورد بکەن. بۆیە دانوستانیان دواخست تا ئاکامی دانوستانی یەکگرتنەوەی عەرەبی لەنێوان عێراقو میسرو سوریا دەردەکەوێت.

لە (١٨)ی نیسانی ساڵی (١٩٦٣)دا حکومەتی عێراقی لەلایەك بەمەبەستی زیاتر دواخستنی چارەسەری کێشەی کوردو لە لایەکی تر بۆ بەشداری کردنی وڵاتە عەرەبییەکان لە رووبەرووبوونەوەی کوردەکان رێگای دا بە شاندێکی کوردی بە سەرۆکایەتی مام جەلال سەفەر بکەن بۆ وڵاتانی میسرو لەوێ گفتوگۆو دانوستان لەگەڵ جەمال عەبدولناسرو سەرکردەکانی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو بکەن، بەڵام ناسر هیچ پەیمانێکی بە کورد نەداو وەفدەکە گەرایەوە. بۆیە لە حوزەیران ساڵی (١٩٦٣)دا دانوستانەکان شکستی هێناو شەڕ دەستی پێکردەوە. لە راستیدا ئەم شەڕە لە بەرژەوەندی میسرو سوریادا بوو، کە بەردەوام عێراقێکی لاوازیان پێ باشتر بوو نەك عێراقێکی ئارامو بەهێز. بۆ ئەوەی بتوانن سوود لە نەوتو داهاتی عێراق ببینن مەرجو سیاسەتەکانی خۆیانی بە سەریدا بسەپێنن. بە دەستپێکردنەوەی شەڕ حکومەتی عێراق چەند رێوشوێنێکی گرتەبەر. لەوانە چەکدارکردنی عەشیرەتە کوردەکان (نەیار لەگەڵ بارزانی) لەوانە زێبارییەکان هێزێکی ئانیزامیان لێ دروستکرا، بەمەبەستی لێدانی شۆڕشی کورد. ئەمە جگە لە دامەزراندنی هێزی شۆڕەسوارانی سەلاحەدین (فورسان سەلاحەدین)و هێزی فورسانی (خالید بن ئەلوەلید) لە هەندێك عەشیرەتی عەرەبی لە دەورووبەری موسڵو راهێنانیانو چەکدارکردنیان بە شێوەیەکی باش بۆ لێدانی کورد. سوریا بۆ پاڵپشتی حکومەتی عێراقو زیاتر خۆشکردنی ئاگری شەڕ هێزێکی سەربازی گەورەی نارد بۆ هاوکاری سوپای عێراق لە لێدانی شۆڕشی کورد، بەڵام دوای ئەوەی دەرکەوت عێراق توانای لەناوبردنی شۆڕشی کوردی نییەو ئەم شەڕە عێراقو عەرەبەکان تووشی زیاتر نەهامەتیو وێرانکاریی دەبات. لە شوباتی ساڵی (١٩٦٤)دا جەمال عەبدولناسر هاتە کێشەکەوەو شەڕی راگرتو چەند دانیشتنێك لەنێوان کوردو دەسەڵاتی عێراقدا ئەنجامدراو دواتر بەندکراوەکان ئاڵوگۆڕکرانو گوشار لە سەر کوردستان هەڵگیراو ئیدارەی حکومەتی عێراق گەڕانەوە ناوچە کوردییەکانو نەخشەیەکیش بۆ سەرلەنوێ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان دانرا، ئەم ئاگربەستە بۆ ماوەی بیست مانگ ئاشتی لە عێراقو کوردستان بەرقەرار کرد، بەڵام جارێکی تر لە کۆتایی ساڵی (١٩٦٥)دا دانوستانەکان بە هۆی خۆدزینەوەی حکومەتی عێراقی لە جێبەجێکردنی پەیمانەکانی شکستی هێناو گەیشتە بن بەست. بۆیە لە ساڵی (١٩٦٦) جارێکی تر شەڕ لە کوردستان دەستی پێکردەوەو ئەم شەڕە بەردەوام بوو تا (٢٩)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٦)، لە دوای بەیانەکەی عەبدولڕەحمان بەزاز سەرۆکی حکومەتی ئەو کاتە ئامادەی خۆی راگەیاند بە جێبەجێکردنی سەرجەم ئەو بڕیارانەی لە دەستووردا هاتووە. ئەو کات کورد نەك هەر دەیویست لەگەڵ حکومەتی عێراقیدا بە ئاشتی بژێت، بەڵکو مەبەستی بوو سەرجەم ساردیو ناکۆکییەکانی، کە لە سەردەمی پێشوودا بە دەستی بێگانەو دوژمنانی کوردو تورکمان کەوتبووە نێوان هەردوو لایەنەوە چارەسەر بکات. پارتی دیموکراتی کوردستان نوێنەری کورد بوو. لە رێگای ئەمەوە کوردەکان چەندین دەستپێشخەرییان بۆ ئاشتبوونەوە لەگەڵ تورکماندا خستەڕوو، کورد بەوەی، کە زۆرینەی هەرە زۆری دانیشتووانی کەرکوكو ناوچەکانی تری کوردستان پێك دەهێنێت بەردەوام مەبەستی بووە ئاشتی لەم ناوچەیە سەقامگیر بێت، بۆیە زۆرجاریش نەك هەر دەستپێشخەر بووە بۆ ئاشتی، بگرە لێبووردنی خۆی لەوانەی، کە زیانیان پێبەخشیووەو دژایەتیان کردووە راگەیاندووەو لە زۆر زوڵمو ناهەقی چاوپۆشی کردووە. ئەمەش لەپێناو دوورخستنەوەی شەڕو نائارامییو ماڵوێرانی لەلایەن کوردستانەوە، بەڵام لایەنەکانی تر ئەم ناوچەیەیان بە وڵاتی خۆیان نەزانیوە. بەردەوام هەوڵی تێکدانی پەیوەندییەکانو بەرپاکردنی شەڕو پشێویو نائارامییان داوە.

لەو کاتەدا چەند ئەندامێکی مەکتەبی سیاسیی پارتی بە سەرۆکایەتی شەهید ساڵح یوسفی هەوڵی هێورکردنەوەو چاککردنی پەیوەندیی نێوان کوردو تورکمانیان دا. بۆ ئەم مەبەستەش پەیوەندییان بە چەندین کەسایەتی ناوداری تورکمانەوە کرد. لە وەڵامدانەوەدا تورکمانەکان بوون بە دوو بەشەوە. پیاوانی بە تەمەنو خاوەن ئەزموون تێڕوانینەکانیان باشو ئەرێنی بوو، داوایان لە خەڵك دەکرد پابەندی ئاشتی پێکەوە ژیان بن لەگەڵ کوردەکانداو ئەو راستییانەیان دەخستەڕوو، کە ئێمە دوو گەلی چەوساوەو زوڵم لێکراوین لە عێراقداو مێژوویەکی دوورو درێژی پێکەوە ژیانمان هەیە، بەڵام بەشێك لە لاوەکانی تورکمان تەنها گوێیان لە دەسەڵاتدارانی تورکیا دەگرتو لە بازنەی بەرژەوەندییەکانی تورکیادا کاریان دەکرد نەك لە بازنەی بەرژەوەندییەکانی تورکمانی عێراقدا، کە زۆربەیان نیشتەجێی کوردستانن. هەندێك لە تورکمانەکان هۆکاری ئەو شکستە دەگەڕێننەوە بۆ ئەوەی کورد ئەوکاتو ئێستا داوای سەربەخۆیی نەکردووەو

ئەوان باوەڕیان بەوە نییە کورد بتوانێت پارێزگارییان لێ بکات.

*** بەشی سیازدە: ڕەشترین ڕۆژی عێراقییەکان:**

لە (١٧ – ٣٠)ی تەمووزی ساڵی (١٩٦٨) بەعسییەکان توانیان بە دوو کودەتای یەك لە دوای یەك کۆتایی بە تەواوی دەسەڵاتی عارفییەکان بهێنن‌و بە تەنها بێنە سەر کورسی دەسەڵاتی عێراق. حیزبی بەعس هەر لە سەرەتاوە چەمکی ڕزگاریی نەتەوایەتی کردبووە ناونیشانی بەرهەڵستکاری بۆ ڕژێمەکەی قاسم‌و هەر لە ڕۆژانی یەکەمەوە زیاتر نزیك بوو لە عەبدولسەلام عارف، کە کەسایەتیی دووەمی کودەتاکەی قاسم بوو. سیاسەتەکانی بەعس بۆ پشتگیری لە عارف بەمەبەستی دژایەتکردنی قاسم بوو، بەڵام عەبدولکەریم قاسم وەك حیزبێکی بچووك دەیبینی‌و پێی وابوو بەعس هیچ وابستەیەکی نییە لەگەڵ کولتووری نیشتمانی‌و گەلی عێراق. بۆیە هیچ سەنگێکی بۆیان دانەناو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێزی گەشەکردنی حیزبی شیوعیی بەکاری دەهێنا. بەعسییەکان هەژاریی خەڵك‌و سۆزی خەڵکیان بەکاردەهێنا لە دژی عەبدولکەریم قاسم.

دەرهێنانی یاسای (اصلاح الزراعي) وای لە دەرەبەگەکان کرد هەموویان لە دژی قاسم بچەنە پاڵ بەعسییەکان. لە ڕاستیدا بەعسییەکان هیچ بیرو باوەڕێکی ڕوونیان نەبوو، جگە لە کۆمەڵێك دروشمی دژ بە یەك‌و ناکۆك نەبێت. ئەوان لە پەیامەکانیاندا لەوپەڕی چەپەوە بۆ ئەوپەڕی ڕاستیان کۆدەکردەوە. بەعسییەکان ببوون بە مەنجەڵێکی گەورەو سەرجەم بیرو ئایدیاکانیان لە خۆیان ئاڵاندبوو، تێکەڵەیەك لە جیاوازترین گوتارەکانی سیاسیی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری.. هتد، یان لێکگرێ دابوو. چونکە لە ڕاستیدا بەعس نەك لە دواتەمەنیدا بگرە لە سەرەتای دروستبوونییەوە تا ڕووخانی لە عێراق تەنها بەرگو دیکۆر بووەو هیچ ناوەڕۆك‌و ئامانجێکی نەبووە جگە لە بەرژەوەندی چەند کەس‌و گرووپێکی مافیا نەبێت. ئەم سیاسەتەی بەعس لەبەر ئەوە بوو بەعسییەکان لە هەموو عێراقدا کەمینە بوون نەیان دەتوانی پێویستییەکانی کوشتن‌و برین‌و تەعزیب‌و لێدانی هێزەکانی حیزبی شیوعی‌و هەوادارانی قاسم بکەن. بۆیە بەمەبەستی بەهێزکردنی خۆیان ئەم تێکەڵەیان دروستکرد تا هەموو نەیارەکانی قاسم‌و شیوعییەکان بگرنە خۆیان. بۆ ئەم مەبەستەش وەك ئەوەی حەسەن عەلەوی باسی لێوە دەکات، بەعسییەکان کۆمەڵێك زمان‌و گوتاری جیاوازو ناکۆکیان بەکارهێنا بۆ فریودانی خەڵك. ئەمانە هەر لە سەرەتاوە خەڵکیان کرد بە چەند توێژێکەوەو هەر یەکێك لەوانەش گوتاری تایبەتییان بۆ دادەنا، لەوانە:

١. گوتاری ئایینی: بەم گوتارە بەعسییەکان بەرگی ئیسلامەتی‌و خواپەرستیان لەبەرکردو عەقیدەی زۆرینەی خەڵکیان بەکاردەهێنا بۆ دژایەتیکردنی شیوعییەکان، ئەم گوتارەی بەعسییەکان هەر لە بنەماوە لەوێوە گاڵتەجاری بوو بە خەڵك، کە لەلایەن کەسێکەوە ئایدیای بەعس دانرابوو خۆی نەك هەر هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نەبوو، بەڵکو ئەو کەسە میشیل عەفلەق بوو، کە پیاوێکی جوولەکەی دژ بە عەرەب بوو. خودی خۆی پیاوێکی دژ بە ئیسلامیش بوو. تەنانەت تا لە ژیانیشدا مابوو بەعسییەکان نەیانتوانی هیچ قسەیەکی بەدەمەوە بکەن، بەڵام دوای مردنی دەیانوت میشیل عەفلەق بووە بە ئیسلام.

٢. گوتاری چینایەتی: لەم گوتارەدا بەعسییەکان بە ڕوونی دوو ڕوویان هەبوو. لە لایەك بە هەڵگری بیری سۆشیالیستی سۆزی کرێکاران‌و جووتیاران‌و هەژارانیان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشا، ئەمەش بۆ ئەوان چارەسەرێکی مامناوەندی بوو لەنێوان بەرژەوەندییەکانیان‌و بیرو باوەڕی بە ئیسلامی بوونیان. بەعسییەکان ئەم بیرۆکەیەیان لە جەمال عەبدولناسرەوە وەرگرتبوو لە هەمان کاتدا بە ڕوویەکی تردا بەعسییەکان دژایەتی شیوعییەتی خۆیان ئاشکراکرد بۆ دڵنەوایی دانەوەی بۆرجوازییەکان‌و کەسانی خاوەن باوەڕ بە سۆشیالیستی بەعسیان بە شێوازێکی تایبەت دەخستەڕوو، کە زۆر جیاوازە لە سۆشیالیزمی کۆمۆنیستەکان، سۆشیالیستێکی شێوەییان دارشتبوو، کە تەنها بنەمای سۆشیالیستی نەبێت هەموو شتێکی تیابوو.

٣. گوتاری نەتەوایەتی: گوتاری نەتەوایەتی بەعسییەکان ئەوەندە گەورەو فراوانبوو، دەچووە بازنەی خەیاڵەوە، بەڵام ئەمان بە باشی سۆزو بیری گەلی عەرەبی‌و پێویستییەکانیان خوێندەوە. بۆیە قسەیان لە سەر یەکێتی نەتەوەی عەرەبی‌و دەولەتی عەرەبی یەکگرتوو.. هتد دەکرد، بەمە بەعسییەکان نەك هەر گەلی عەرەبی عێراقیان فریو دابوو بگرە یارییان بە سۆزو عەقڵی سەرجەم گەلانی عەرەبیش دەکرد. لەم بازنەیەدا بەعسییەکان لەنێوان ساڵانی (١٩٥٥ – ١٩٦١)، کە سەرەتای دروستبوونیان بوو خۆیان لە سێبەری جەمال عەبدولناسردا حەشار دابوو، سۆزی جەماوەری ناسرییەکانیان بۆ خۆیان ڕادەکێشا.

٤. گوتاری عیلمانی، بەعسییەکان بۆ فریودانی لاوان، کە بزووێنەرو وزەی هەموو گۆڕان‌و پێشکەوتنەکان بوون‌و زۆرینەی هێزە زیندووەکانی گەلیان پێکدەهێنا. بە چەندین ڕێگا کاریان بۆ ڕاکێشانیان دەکرد. گوتاری عیلمانی‌و دووپات کردنەوە لە سەر تازەگەری‌و گۆڕان‌و کرانەوەو دژایەتیکردنی بەهای کۆن‌و بانگەشە بۆ ئازادیی‌و مافی ژنان‌و یەکسانی‌و جیاوازیی نەکردن لەنێوان گەلان‌و ئایین‌و تایەفەکاندا. ئامرازی سەرەکی پاوانکردنی لاوان بوو لای بەعسییەکان. ئەمە جگە لە شێوازی ڕێکخستنی حیزبی، کە لای بەعسییەکان تەماعێکی دیار بوو بۆ لاوان، لە سیاسەتەکانی بەعسدا حزب پلەی سەرکردایەتی لە هەموو جێگاو شوێنێکدا پێشکەش دەکرد. تۆ لە هەر کوێیەکدا بوویت ئەگەر قوتابی بیت، یان کرێکار، یان جووتیار، یان شۆفێری ئۆتۆمبیل، تۆ دەتوانیت ببیت بە سەرکردەی گرووپێك‌و خۆت خاوەنی هەموو بڕیارو ڕێنماییەك بیت بە مەرجێك لە چوارچێوەی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی سەرانی بەعس‌و حیزبەکەیان دەرنەچێت. کەسێك، کە دەبوو بە بەعسیی بە چەند مانگێك‌و بە چەند خولێك ڕادەهێنرا لە سەر ڕەوشتەکانی بەعس‌و دواتر پلەی (نصیر – لایەنگر)ی پێ دەدرا. بە واتا سەرکردەی کۆمەڵێکی

دیار. دواتر بە زیاتر تێکەڵبوون بە بەعسو دەربڕینی زیاتری لایەنگری خۆی بۆ هەڵگرتنی ڕەوشتو بیروباوەڕیان لە ماوەیەکی کورتتردا دەبێتە سەرۆکی ئەنسار. ئەمەش بە بارێکی تر خۆی دەبێتە ئەندامی فیرقە تا دەگەیتە ئەندامی شوعبە، بە واتا سەرۆکی فیرقەو دواتر ئەندامی فەرعو بە واتا سەرۆکی شوعبە.. هتد. لە حیزبەکەی عەفلەقدا تۆ بەردەوام لە سەرکردایەتیدا دەبوویتو بەردەوام لەو تینوویەتیو ئارەزووەی سەرکردایەتی، کە نەخۆشییەکی گەلانی ڕۆژهەڵاتە تێر دەبوویت. هاوکات تۆ لەم ڕێکخراوەدا جگە لە پلەو ناوەکەت هیچ ئازادیو بۆچوونو ڕایەکی خۆت نەبوو.

بەعسییەکان بۆ زامنکردنی سەرکەوتنو بەردەوام بوونیان لە دەسەڵاتو حوکمی عێراق ببوون بە بەشێك لە دەزگا سیخوڕییەکانی داگیرکەرانو هەموو ویستو ئارەزووەکانیان جێبەجێدەکردنو بەرژەوەندییەکانیان دەپاراست. پێش ساڵی (١٩٧٢) لە عێراقدا تەنها چەند کۆمپانیایەکی بیانی کاریان دەکرد، بەڵام دوای بڕیاری خۆماڵیکردنی نەوتو بە ناو دەرکردنی کۆمپانیا بیانییەکان ژمارەی ئەو کۆمپانیا بیانیانە لە ساڵی (١٩٨٠) گەیشتە زیاتر لە (٣٥٠) کۆمپانیاو دواتریش لە دوای یەك ساڵ گەیشتە (١٠٥٠) کۆمپانیا(*).

لە ڕاستیدا ئەوە زۆر ئاشکرایە، کە بەعسییەکانو خودی سەدام حوسێن خۆیان چۆن دروستکران لەلایەن داگیرکەرانو دوژمنانی عێراقەوە بۆ کۆتایی هێنانو یەکلایکردنەوەی ئەم ڕاستییەش تەنها ووتەکەی ساڵح سەعدی زەعیمی حیزبو بەشدار لە بزووتنەوەی شوباتو جێگری سەرۆك وەزیرانی ئەوکات، کە دەڵێت: "اننا جئنا الى السلطة بقطار اميركي"، هەموو نهێنییەکان ئاشکرا دەکات.

بەعسییەکان بە قایمکردنی جێ پێی خۆیان بە کوشتو بڕی شیوعییەکانو هەوادارانی قاسمو ڕاوەدوونانی نەیارەکانیانەوە نەوەستان، بەڵکو زۆر دڕندانە کەوتنە وێزەی کوردو گەلانی عێراق. بەمەش کێشەی کورد چووە قۆناغێکی نوێوەو شۆڕشی ڕزگاری نیشتیمانی بە هۆی ئەو زوڵمو زۆرو کوشتنو بڕینو ڕاوەدوونانەی خەڵکی بێ دیفاعی کورد ژمارەیەکی زۆر لە هاووڵاتیانی لە کاسبو خوێندکارو فەرمانبەر.. هتد، ڕوویانکردە شاخەکانی کوردستانو پەیوەندییان کرد بە شۆڕشەوەو بەعسیش زۆر دڕندانەتر کەوتە وێزەی ئەوانەی لە شارەکاندا مابوونەوە. لێرەوە قۆناغی دووەمی تەعریب دەستپێکرد. شاڵاوی تەعریبو تەبعیسو تەرحیل لە دوای (١٧)ی تەمووزی ساڵی (١٩٦٨)دا زۆر ڕێکترو بە بەرنامەترو فراوانتر بوو لە پێشوو. ئەم سیاسەتەش لە شاری کەرکوکدا، کە خاڵی ناکۆکی نێوان کوردو عەرەب بوو لە هەموو جێگایەك زیاتر چڕ ببووەوە. سیاسەتی ترساندنو کوشتنو ڕاگواستن لە کەرکوکدا گەیشتە ئاستێك سنوورەکانی هەموو عەقڵو ویژدانێکی مرۆڤی بڕیبوو. بە شێوەیەك زۆر لەو زوڵمە گەورەتر بوو، کە پێشتر دەسەڵاتی عەرەبی لە عێراقدا لە جوولەکەکانی کردووەو دوای دەرکردنو ڕاوەدوونانیان ماڵو سەروەتەکانیشیان داگیرکردوونو بە تاڵان بردوویانە.

(ن. ج) پیاوێکی بە تەمەنی کوردە، دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئەو کات، کە جوولەکەکان لە کەرکوك ڕایاندەکرد لە دەست زوڵمو زۆری عەرەبە شۆڤێنیستەکان بە ئێمەیان دەوت: قوڕتان بە سەر ئێمە دەڕۆین ژنو منداڵەکانمان دەبەین، بەڵام ئێوە بێ پێنو خاوەنی نەك سەروەتو سامان نین، بەڵکو نابنە خاوەن ژنو منداڵو ناموسیش.

لەم قۆناغەدا نەك هەر کورد، بەڵکو تورکمانیش لە کەرکوکدا کەوتەبەر لێشاوی زوڵمو زۆری بەعسییەکانو ژمارەیەکی زۆر کەسایەتیو بازرگانو پیاوە ناودارەکانی تورکمان لە (٦)ی کانونی دووەمی ساڵی (١٩٦٩) بۆ چاوشکاندنی تورکمان دەستگیرکران، ئەمەش بۆ خۆی نامەیەکی زۆر ڕوونو ئاشکرا بوو بۆ ئەو کەسانەی باسی ماڤی نەتەوایەتی کەمینە بکەن لە عێراقدا. لە ساڵی (١٩٧٠) دا عێراق لە ژێر گوشاری نەتەوە یەککگرتووەکانو جیهاندا بۆ پاراستنی کەمینە نەتەوەییەکان بڕیاری (٨٩)ی ڕاگەیاندو ڕێگای دا بە تورکمانەکان هەندێك ماڤی ڕۆشنبیریو خوێندن بە زمانی دایك (تورکمانی) لەو ناوچانەی تێیدا جێگیرن دابین بکرێت، بەڵام دواتر بە هۆی کەمی خوێندکاری تورکمانەوە خوێندن بە زمانی تورکی شکستی هێنا.

لە (٢٤)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧١)دا، یانەی برایەتی تورکمان لە کەرکوك ئاهەنگێکیان سازکرد لە سینما سەڵاحەدینو سەرجەم بەرپرسە حیزبیو حکومییەکانیان میوانداریی کرد، بۆ ڕاکێشانی سۆزیان. هاوکات داوای ئەوەشیان لێکردن پاڵپشتیان بکرێت بۆ دامەزراندنی دەرچووانی لاوە تورکمانەکان لە زانکۆو پەیمانگاکان. دەسەڵاتی عێراقو بەعسییەکان، کە ئەو کات لەگەڵ کوردا لە شەڕدا بوون، بۆ وەدەرنانی کورد لە کەرکوكو زیاتر سەپاندنی سیاسەتی تەعریب هەندێك ڕوویان بە لای تورکماندا وەرگێڕاو دەرچووانی زانکۆو پەیمانگاکان ئەوانی تورکمان بوون لە فەرمانگەو کارگەو کۆمپانیای نەوت.. هتد لە کەرکوك دامەزران.

لە ساڵی (١٩٧٥) دوای ئەوەی سەدام ڕازی نابێت بە دانی مافەرەواکانی کوردو هاوکات ئەوەش دەزانێت، کە ئێران پاڵپشتی چەکو ڕێگای وەرگرتنی یارمەتییە دەرەکییەکانی کوردەو هاوکات بە یارمەتی ئێران نەبێت ناتوانێت هێزی پێشمەرگەی کورد لەناوبەرێت. بۆیە پەنا دەباتە بەر ئێرانو لە بەرانبەر توانەوەی شۆڕشی کورد ناوچەی (شط العرب) ی پێدەبەخشێت. کوردەکانیش لە شاخدا بێ کەس بە گەلەکۆمەیەکی چەند لایەنە لەنێوان عێراقو ئێرانو ئەمەریکادا، کە لە وڵاتی جەزائیر پلانی بۆ دادەنرێت دەرووخێتو وڵاتی عێراقیش لێبووردنێکی گشتی بۆ دەردەکات. لە ئاکامدا هەندێکیان دەگەڕێنەوە عێراقو هەندێکشیان ڕوو لە ئێران دەکەنو لەوێ ماڤی مانەوە وەردەگرن. کوردەکان جارێکی تر دەبنەوە قوربانی بەرژەوەندییە سیاسیو ئابوورییەکانی ئەمەریکاو وڵاتانی ناوچەکە. لەمەڕ ئەم کارەساتە کیسنجەر دەڵێت:(اننا سوف نتخلى عن الاكراد، لكي يتمكن العراق ان يتفرغوا للسوريين، لأن هؤلاء يرفضون الدخول في مفاوضات من اجل المرحلة الثانية لفض الإشتباك)، هەروەها دەڵێت: (لقد كانت سياستنا غير اخلاقية ازاء الاكراد، فلا نحن

ساعدناهم، ولا نحن ترکناهم یحلون مشاکلهم بالمفاوضات مع الحکومة العراقیة، لقد حرضناهم، ثم تخلینا عنهم)[٣٣] لە وەڵامی پرسیارێکی ڕۆژنامەنووسیدا، کە ئەو کات لە پەراوێزی شکستهێنانی شۆڕشی کورد لە کیسنجەر دەکرێت، ئایا پەیوەندیی نێوان سیاسەتو ئەخلاق چییە؟ لە وەڵامدا کیسنجەر دەڵێت: دوو شتی تەواو جیاوازن‌و هیچ پەیوەستییەك لەنێوانیاندا نییە، هەروەها دەڵێت: فەرمانڕەوایی عاقڵ ئەوەیە، کە وەفا نەزانێت لە بەرانبەر زیان لە بەرژەوەندیی وڵاتەکەی، زۆرجاریش ئەو وتەیەی هیتلەری دەوتەوە، کە دەڵێت: من باوەڕم بە یاساکانی ئەخلاق نییە لە سیاسەتدا.

لە (٢٥)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٩)دا، واتا چەند مانگێک بەر لە هەڵگیرسانی شەڕی عێراق – ئێران، بەمەبەستی چاوشکاندنی کوردو تورکمان ڕژێمی بەعس کەوتە گرتن‌و لە سێدارەدانی دەیان کوردو چەندین کەسایەتی تورکمان، شاڵاوی گرتن‌و کوشتنی کورد بە بەرنامەو بێ بەرنامە لە ستراتیجیەتی بەعسدا بوو، بەڵام وەك تورکمان بەعسییەکان کەوتنە دەستگیرکردنی چەند کەسێکی دیاریکراو لە تورکمان، ئەوانەی، کە بۆنی تورکمانچێتییان لێدەهات، وەك دکتۆر نەجدەت نورەدین قوجاغ‌و عەمیدی خانەنشین عەبدوڵڵا عەبدولرەحمان، هەروەها دەستگیرکردنی د. ڕەزا ئەلدیمرجی‌و بازرگان عادل شەریف، لە بەرواری (١٦)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٨٠) لە سێدارە دران. بەمەش تورکمان بە تەواوەتی لە ڕووی سیاسییەوە کۆتایی هات. بە هاتنەسەر حوکمی سەدام، یانەی برایەتی تورکمان جارێکی تر دەکەوێتە بەر شاڵاوی پاکسازیی. سەرەتا بە لەسێدارەدانی سەرۆکی یانەکەو چەند ئەندامێکی دەستپێدەکات. تا دواتر یەکێك لە پیاوەکانی خۆی دەکاتە سەرۆکی یانەکەو هاوکات لقی موسڵیش دادەخات. لە ماوەی دەسەڵاتی سەدامدا کوردو تورکمان لە هەموو سەردەمەکان زیاتر زوڵم‌و دەربەدەریی‌و کوشتوبڕیان چەشت. کورد بە گشتی‌و بە شێوەیەکی زۆر فراوان ڕووبەڕووی سیاسەتی جینۆسایدو کوشتنی بە کۆمەڵ بوەوە، بەڵام وەك تورکمانەکان لەبەر ئەوەی لە سیاسەت دوورکەوتنەوەو ڕوویان کردە کاری بازرگانی کەمتر ڕووبەڕووی زوڵم‌و لەناوچوون بوونەوە. لە هەمان کاتدا دەسەڵاتی سەدام‌و دارو دەستەکەی بوونی تورکمانیان لە عێراقدا وەك هاووڵاتی ڕەتدەکردەوە. بۆ نموونە لە یەکێك لە سەردانەکانیدا کاتێ تاریق عەزیز سەردانی تورکیا دەکات بەمەبەستی ئاسییکردنەوەی پەیوەندییەکانی نێوان تورکیاو عێراق‌و هاوکات بەستنی چەند ڕێککەوتننامەیەك بۆ لێدانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان. یەکێك لە بەرپرسانی تورکیا باس لە بوونی تورکمان دەکات لە عێراق. عەزیز لە وەڵامدانەوەدا ڕاستەوخۆ دێتەگۆو دەڵێت: "تورکمان لە عێراقدا نییە، هەندێك خێزان هەن، بەڵام ئەوانە میوانن لای ئێمەو ئەگەر زۆر بیریان دەکەن دەتوانین بۆتانی بنێرینەوە". بەرپرسە تورکەکان دەزانن بەرپرسانی بەعس ئەو قسەیەیان زۆر بە ڕاستە، بۆیە بێدەنگ دەبن‌و ئەو باسە جارێکی تر لەنێوان تورکەکان‌و حکومەتی بەعسدا دروست نابێتەوە.

حیزبی بەعس‌و سەدام دوای ئەوەی بە کودەتایەکی نێودەوڵەتی بزاڤی کوردی لەناو دەبات، تا ساڵی (١٩٧٩) کۆتایی بە پاشماوەی حیزبی شیوعیش لە دەسەڵاتدا دەهێنێت.

لە ساڵی (١٩٨٠) سەدام ترسی لە جەنەراڵە سەربازییەکانی خۆی دەبێت، بۆیە برەو بە سوپاو هێزە تایبەتەکانی کۆماری‌و پاسەوانی خۆی دەدات‌و کۆمەڵێك کەسی ئاست نزم‌و نا ڕۆشنبیرو بێ توانا لە خۆی کۆدەکاتەوە. هاوکات بۆ دوورخستنەوەی سوپا لە خۆی‌و کودەتا لێی، وەك ئەوەی مێژوویی سیاسی‌و سەربازیی عێراق‌و گەڕاندنەوەی ناوچەی شەتولعەرەب شەڕی دژ بە ئێران ڕادەگەیەنێت. ئەم شەڕە هەشت ساڵ دەخایەنێت، تا ئابووری عێراق بە تەواوی ووشك دەکات. سەدام ئەم شەڕەی بە پاڵپشتی ئەمەریکاو ڕۆژئاوا یەکلا کردەوە، لەم ماوەیەدا بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کوردی دەتوانێت گەشەکردنێکی بەرچاو بە خۆیەوە ببینێت، بەڵام سەدام بە کۆتایی شەڕ شاڵاوی جینۆساید لە دژی کورد دەست پێدەکات، لە دوای لێدانی کورد بە چەکی کیمیایی لە چەندین ناوچەو شاری کوردستان، لە دوای هەڵەبجەی شەهید شاڵاوی ئەنفال دەست پێدەکات‌و زیاتر لە سەدو هەشتا هەزار کورد لە ژن‌و منداڵ‌و پیاو زیندەبەچاڵ دەکات‌و پێنج هەزار گوند خاپوور دەکات‌و بە سەدان هەزار مەڕو ماڵات‌و بە ملیۆن پەلەوەر لەناو دەبات. لێدانی هەڵەبجەو ئەنفال کوردی بە تەواوی لە پەلوپۆ خست. شێوازی ئەم تاوانە لە مێژوودا نموونەی زۆر ئەستەمە، بەڵام لە ڕووی سیاسییەوە کوردی بردە قۆناغێکی نوێوە، ئەم گۆڕانەش هاوشانی گۆڕانێکی زۆر مەزن بوو لە بازنەی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا، هەروەها هاوشانی دارمانی سیستمی دوو جەمسەری‌و ڕووخاندنی بلۆکی ڕۆژهەڵات بوو. تاوانەکانی ئەنفال‌و جینۆسایدی کورد زۆر لەوە بلندترو مەزنترە، کە هیچ پێنووسێك بتوانێت گوزراشتی لێبکات. بگرە بە دەیان ڕۆمان‌و چیرۆك‌و شیعرو شانۆو وتاری سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری.. هتد. سەردێڕی ڕووداوەکانی ناگێڕدرێتەوە.

سەدام حوسێن لە دوای ئەوەی ئەم تاوانەی بۆ چووەسەر، چاوی بە تەواوی ڕەشبوو، خۆی لێبوو بە یەزدان‌و کەس نەبوو بتوانێت پێی بڵێت تۆ تاوانباری. بۆیە فێری شەڕو خوێنڕشتن‌و خواردن بوو، نەیدەتوانی بێ شەڕ بژی. هاوکات درکی بەوەش کردبوو، کە هەوڵەکانی تیرۆرکردنی لە ئاشتیدا لە زیادبووندایە، بۆیە وا بیری دەکردەوە بۆ ئەو شەڕ لە ئاشتی چاکترەو هاوکات ئەوەی شەڕ نەیتوانی ئەنجامی بدات بۆ ڕووخاندن‌و لەناوبردنی سەدام سوپا بە کودەتا لە ئاشتیدا ئەنجامی دەدات، بۆیە هەر شەڕێك، کە تەواو دەبوو ڕاستەوخۆ بیری لە شەڕێکی تر دەکردەوە.

لە دوای کۆتایی هاتنی شەڕی عێراق – ئێران، سەدام بەمەبەستی دوورخستنەوەی ترسی سوپا لە خۆی کەوتە دوورخستنەوەو لەناوبردنی ئەفسەرە پلەدارەکان، ئەوانەی خاوەنی تێروانین‌و کەسایەتی تایبەتی خۆیان بوون و لە جێگایان چەندین کەسی نەشیاو بێکەڵکی دادەمەزراند. بێ

ئەوەی هیچ سیفاتێکی مرۆڤایەتیو رەوشتی ئەفسەرییان تێدا بێت، بەڵکو زۆربەی ئەو کەسانە خەڵکانی بێ رەوشتو نەفس نزم بوون. سەدام بە کەیفی خۆی دەیتوانی هەڵیانسووڕێنێت، سەدام حوسێن لە دوای شەڕ، گەیشتە ئەوپەڕی غرورییەتو بەرزترین پلەی سەربازی لە شانی خۆی ناو لە گرنگترینو هەستیارترین باسو خواستە زانستیو ئەکادیمیاکان قسەی دەکردو کەسیش نەیدەتوانی رەخنەی لێبگرێت. تا کار گەیشتە ئەو ئاستەی گاڵتەی بە بیرو عەقڵی خەڵکی عێراق دەکرد.

سەدام بۆ پتەوکردنی هێزی بەرگریی لە خۆی بە دەیان کەسیی عەشیرەتەکەیو بنەماڵەکەی هێنایە پێشەوەو گرنگترین پۆستە هەستیارەکانی عێراقی دایە دەستیان. نموونەیەك لەوانە: عەلی حەسەن مەجید بوو، کە سەدام لە هەر کوێ هەستی بە ترسی بەرهەڵستکاری بۆ رژێمەکەی هەبووایە، عەلی حەسەن مەجید (عەلی کیمیایی)ی بۆی دەنارد تا رەشو سپی ئەو جێگایە بسووتێنێت، لە دوای شەڕ سەدام بۆ لەناوبردنی شۆڕشی کورد فەرمانی بە سوپاکەی دا چەندین هێرش بکەنە سەر هێزی پێشمەرگەی کوردستان، بەڵام دوای ئەوە سوپا ناتوانێت ویستەکانی سەدام بە جێ بگەیەنێت. بۆیە سەدام عەلی حەسەن مەجید دەنێرێتە کەرکوكو هەموو دەسەڵاتێکی دەداتێو فرمان دەدات بە جینۆسایدکردنو ئەنفالکردنی سەرجەم گوندەکانی کوردستان، دواتر لە چاڵەکانی باشوور لە گۆری بە کۆمەڵدا بە زیندوویی دەیانشارێتەوە. یەکێك لەو ئەرکە سەرەکییانەی عەلی نەهێشتی کورد بوو لە کەرکوك. بۆیە وەك گورگ ئاسا ئەکەوێتە گیانی خەڵکی هەژارو بێ دەسەڵاتی ئەو شارەو شەلو کوێر ناپارێزێت. چۆن بۆی بگونجێت لە کوشتنو تەعریبو راگواستن ئەنجامی دەدات، ئەم راستییە عەلی کیمیایی خۆشی دانی پێدادەنێتو بە دەستکەوتێکی گەورەی دەزانێت. لە یەکێك لە کۆبوونەوەکاندا لەگەڵ بەرپرسانی حیزبی بەعسو سوپاو ئەمندا، کە لە بەرواری (١٥)ی نیسانی ساڵی (١٩٨٩) رووداوەکانی لە سەر کاسێتێك تۆمارکراوەو لە راپەرینەکەی ساڵی (١٩٩١)دا دەکەوێتە دەست کوردە راپەریووەکان، لەو کاسێتەدا بە راشکاوی دەڵێت: دەمەوێت قسە لە سەر دوو خاڵ بکەم. یەکەم تەعریبەو دووەم ئەو ناوچە هاوبەشانەیە، کە دەکەوێتە نێوان زەوییە عەرەبییەکانو ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان. ئەو خاڵەی کە گرنگە بە لامەوەو دەمەوێت جەختی لە سەر بکەمەوە ئەوە خاڵی کەرکوکە. کاتێك من هاتم بۆ کەرکوك ژمارەی عەرەبو تورکمان پێکەوە (٥١٪)ی کۆی دانیشتووانی کەرکوك تێپەری نەدەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا بری شەش ملیۆن دۆلار خەرجکرابوو بۆ ئەوەی بارودۆخەکە بگەیەنین بەم ئاستە. بۆیە من بریارمدا بە قەدەغەکردنی کارکردنی کوردی کەرکوك لەم شارەو ناوچەکانی دەوروبەری لە دەرەوەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی. لە ساڵی (١٩٨٨) تا ساڵی (١٩٩١) رژێمی بەعس ئەوەی بۆی کراو بۆی لوا لە کوشتنو راگواستنو لە ناودانی کورد ئەنجامیدا. لەو ماوەیەدا گەورەترین تاوان لەم ناوچەیەدا بەرێوەدەچوو بێ ئەوەی کەسێك هەبێت رەخنەی لێبگرێتو لە دژی بدوێت. لە کۆتایی ساڵی (١٩٩١) عێراق لە مشتی سەدامدا جێگای دەبووەوەو سوپایەکی درندەو لە خۆ بایی دروستکردبوو، بۆیە بریاریدا پەلاماری کوەیت بداتو توانی لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا داگیری بکات، بەڵام ئەم کارەی سەدام لێدانی بەرژەوەندییە نەوتییەکانی کۆمپانیا بیانییەکان بوو. بۆیە زۆر بە خراپی بە سەریدا شکایەوەو سوپا مەزنەکەی لە بەرانبەر هێزی هاوپەیمانان نەك هەر چۆکیان دادا، بگرە بە شێوەیەك رسوابوون، کە ئابرووی عێراقیان برد. بۆیە کاتێك ئەو سوپایە بە رووتیو رەجاڵیو شریو پەرپووتی لە کوێت دەرکرا. خەڵکی عێراق بە گشتی لە ناخەوە بۆ عێراقو ئەو بارەی بە دەست سەدامەوە تێکەوتبوو دەسووتان. گری راپەرینو نارەزایی سەرەتا لە باشوورەوە دەستپێکردو دواتریش لە کوردستانەوە رەشەبای راپەرین لە شاخەکانەوە هاتە خوارەوەو توانی لە (٢١) ئازاردا شاری کەرکوکیش رزگار بکات، بەڵام سوپا بەزیوەکەی عێراق وەك پیشەی تایبەتی خۆی زۆر ئازاو جەربەزە بوو بۆ گیانی گەلانی عێراقو دوای ئەوەی گلۆپی سەوزی لەلایەن ئەمەریکاو هاوپەیمانانەوە بۆ هەڵکرا، کەوتە وێزەی گەلانی عێراقو کوشتوبرێکی وای ئەنجامدا، کە تەنها لە ئەفسانەکاندا بیستراوە.

لە باشووری عێراق ژمارەیەکی زۆر لە شیعەکان لە ترسی کوشتنی ئەوانەی لە دەست جەلادەکانی بەعس رزگاریان ببوو خۆیان گەیاندە ئێرانو لەوێ مانەوە. لە کوردستانیشەوە زیاتر لە یەك ملیۆن کەس روویکردە شاخەکانی کوردستانو سنوورەکانی ئێرانو لەوێ مانەوە، تا هێزەکانی هاوپەیمانان بریاری دامەزراندنی ناوچەیەکی ئەمنیان لە کوردستانداو کورد بە گشتی گەرانەوە ئەو ناوچەیە. حکومەتی عێراقیش بۆ زیاتر گوشارو لێدانی کوردەکان سەرەتا ئیدارەکەی خۆی لەو ناوچانەی کورد تیادا باڵادەست بوو کشانەوەو دواتریش گوشاری ئابووری زۆر بە توندی بە سەردا سەپاند، بەڵام کورد توانی ئیدارەیەکی تایبەت بە خۆی لەو ناوچانە دابمەزرێنێتو تا ئەمرۆش دوای چەندین ساڵ لە رووخانی بەعس لە عێراقدا هەر بەردەوامە.

*** بەشی چواردە: دروستبوونەوەی سیاسییانەی تورکمان لە سێبەری حکومەتی هەرێمی کوردستاندا:**

لەساڵی (١٩٩٢) حکومەتی هەرێمی کوردستان دامەزراو لە پاڵ ئەم حکومەتە چەندین پارتو رێکخراوی سیاسیی تورکمانی بە یارمەتیو پاڵپشتیی داراییو سیاسیو مەعنەوی یەکێتیو پارتی دامەزران. کوردەکان رێگایان بۆ تورکمانەکان خۆشکرد تا کۆنفرانسێکی نەتەوەیی لە شارۆچکەی سەلاحەدین ئەنجام بدەن. بەمەبەستی یەکخستنی تواناکانیانو رێکخستنەوەو یەکخستنی داواو ئامانجەکانیان. کوردەکان هەر لە سەرەتاوە پاڵپشتی داوا رەواکانی تورکمانیان دەکردو بەوپەڕی ئازادییەوە رێگایان بەو حزبانە دا چالاکیی سیاسیی خۆیان ئەنجام بدەن. هەرچەند هەندێك لەو حزبانە لە بەرانبەر هەندێك دەستکەوتی دارایی کەوتنە تۆڕی جاسوسییەتی تورکیاوەو لە دژی بەرژەوەندیی کوردستان هەڵسوکەوتیان دەکرد، بەڵام حکومەتی هەرێم مانشێتی دیموکراسیو ئازادیو ماڧ چارەی خۆنووسینی بۆ سەرجەم گەلانی عێراق بەرزکردبووەوە. بە هیچ شێوەیەك لە رووی چالاکییە سیاسییەکانی تورکمان نەوەستایەوە. لە کۆنفرانسی سەلاحەدین بە بەشداری پێنج رێکخراوی تورکمانی سازکرا. لەوانە پارتی تورکمانی عێراقی بە سەرۆکایەتی موزەفەر ئەرسەلانو یەکێتی تورکمانە سەربەخۆکان بە سەرۆکایەتیی عەزیز قادر ئەلسمانجیو یەکێتیی ئیسلامیی تورکمانەکانی عێراق بەسەرۆکایەتیی عەباس بەیاتیو دوو رێکخراوی تر، کە یەکێکیان بە سەرۆکایەتیی شوکور سەفەر، ئەوی تر بە سەرۆکایەتیی عەلی ئەلنەجار. زۆر بە ئازادی رەوشو ئامانجو ویستەکانی تورکمان لە عێراقدا خراوەتە ژێر باسو لێکۆڵینەوەوە. جگە لەمانەش، چەندین حزبو رێکخراوی تورکمانی لە هەولێرو سلێمانی دروستبوون، لەوانە پارتی برایەتی تورکمانی وەلید شەریکەو پارتی یەکێتی تورکمانی ریاز ساری کەهییەو بزووتنەوەی سەربەخۆکانی تورکمان لە هەولێر فەرید چەلەبیو پارتی گەلی تورکمان تورهان کەتانە. لە ئاداری ساڵی (١٩٩٥)یش بەرەی تورکمانی بە سەرۆکایەتیی دکتۆر ئیحسان ئەلدۆغرمەچی دامەزرا.

هەر لە سەرەتای دامەزراندنی کیانێکی کوردی لە کوردستانی باشوور، تورکیا جارێکی تر کەوتەوە لێدانەوەی قەوانە کۆنەکەیو کەوتە داواکردنی ویلایەتی موسڵو جارێکی تر ئەو بیانووە مردووەی دەهێنایەوە، کە ویلایەتی موسڵ ئینگلیزەکان بە زۆر داگیریان کردووەو تورکیا بە رێککەوتننامە جێی نەهێشتووە. یەکێك لەو سەرکردانەی تورکیا، کە بە روونیو بێ پەردە کەوتە لێدانی ئەم قەوانە سەرۆك تورگۆت ئۆزال بوو، دواتریش لە ئاداری ساڵی (١٩٩٥) سەرۆکی تورکی سلێمان دیمریل بانگەشەی ئەوەی دەستپێکرد، کە ویلایەتی موسڵ ماڧ تورکیایەو بە شەڕ ئەم ناوچەیەی جێنەهێشتووە، بەڵکو بە هۆی لاوازی توانای لە دانوستانەکانی ئەو کات دۆڕاندوویەتی. تورکیا بەم بانگەشانە بەردەوام گوشاری دەخستە سەر عێراقو کوردەکانیشی تەنگەتاو دەکرد، بەڵام دوای ئەوەی بەشداری شەڕی رووخانی سەدامی نەکرد. پێگەی لە لای ئەمەریکاو رۆژئاوا زۆر لاواز بوو لە یارییەکە رۆڵی لاواز بوو. بۆیە پەنای بۆ هەندێك لایەنو حیزبە سیاسییە تورکمانەکانی عێراقو کەرکوك برد تا لە رێگای ئەوانەوە کێشەو گرفت بۆ حکومەتی ئەمەریکاو عێراق دروست بکاتو گوشارێك لە سەریان دروستبکات، ئەو زەمینەیە بخولقێنێت، کە جارێکی تر رۆڵێکی پێ بدرێتو لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی ئەم ناوچەیەدا دەستکەوتێك بۆ خۆی بەدەست بهێنێت. ئەوەی بە راستی نکۆڵیی لێ ناکرێت، ئەوەیە، کە تورکیا هەڵەیەکی زۆر گەورەی کرد، کە لە بەرانبەر ویستەکانی ئەمەریکا بۆ لێدانی عێراق وەستایەوە. هاوکات گۆڕانی بارو دۆخی دونیاو بیری سیاسیو گۆڕانی پێگەو فاکتەرەکانی بەرژەوەندیی ئابووریی ئەمەریکاو رۆژئاوا، تورکیای خستووەتە پێگەیەکی زۆر لاوازەوە، کە بە درێژایی مێژووی دەوڵەتی تورکیا، بەم جۆرە لاوازو بێ دەسەڵات نەبووە.

*** سەرچاوەو پەراوێز:**

١. (عەرەفە) ناوێکی تەعریبکراوی هەمان ناوی (ئارفا)یە.

٢. تألیف ج. ب. اسمونس، أستاذ الدراسات الایرانیة في جامعة کوبنهاکن، نقلة الي العربیة وعلق علیة جرجیس فتح الله.

٣. (منطقة کرکوك ومحاولات تغییر واقعها القومي)، الدکتور. نوري طالباني، لندن، ١٩٩٠.

٤. (أحیاء کرکوك ومعالمها)، د. صبحي ساعتجي أسطنبول، موسوعة مدائن العراقیة.

٥. (کرکوك في التأریخ)، د. مصطفی جواد، موسوعة المدائن العراقیة، إعداد: سلیم مطر علي تبویني، نصرت مردان. الصفحة ٣٦٥.

٦. (کرکوك في العصور القدیمة)، د. جمال رشید احمد، دار آراس للطباعة والنشر، اربیل، العراق، ٢٠٠٢.

(*) (کرکوك وتوابعها حکم التأریخ والضمیر)، د. کمال مظهر، الجزء الأول.

٧. (الثورة العراقیة)، الصفحة ١٨٠.

٨. م. س. لازاریف ١٩٨٩ الصفحات ٣٠٦، ٣٠٩.

٩. (العشائر والعوائل العراقیة التي أحتضنتها کرکوك عبر العصور)، إبراهیم آوجي، موسوعة مدائن العراقیة، کرکوك.

١٠. (کرکوك في العصور القدیمة)، الدکتور جمال رشید احمد، دار آراس للطباعة والنشر.

١١. (کرکوك ولعنة النفط)، مؤید الراوي، موسوعة المدائن العراقیة.

١٢. ئەگەرچی ئەمە سەد لە سەد ڕاست نییە، چونکە لەگەڵ ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە تورکمان شیوعی بوون، بەڵام وەك ئاراستەی بیری شیوعییەت لە ناو تورکمانەکانو لە هەمان کاتدا لە ناو تورکیاشدا وەك حزب هەبوون.

١٣. (التأریخ السیاسي لترکمان العراق)، شایەنی زانینە خێروڵڵا حەسەن ئەفەندی باوکی هەردوو کوژراوەکەی شەڕی ١٩٥٩دا عەتا خێروڵڵاو ئیحسان خێروڵڵا برایەتی.

١٤. (العراق في عهد قاسم)، جرجیس فتح الله المحامي، الصفحة ٧٣٦.

١٥. (منطقة کرکوك ومحاولات تغییر واقعها القومي)، الدکتور نوري طالباني، الطبعة الثانیة، ١٩٩١، الصفحة ٧٩.

١٦. ڕۆمانی (عەلەبەستێ)، حەسەن جاف.

١٧. (مذکرات ناظم الطبقجلي)، الصفحة ٩٣.

١٨. مذکرات ناظم الطبقجلي)، الصفحة ٢٣٨.

١٩. مامۆستا ئازاد کوڕی تاڵیب جەباریو برای فاتح جەبارییە. سەرچاوەی ئەم زانیارییانەیەو لەو کاتەدا خۆی لە ڕووداوەکەدا بووە، ئێستا لە ژیاندا ماوە.

٢٠ – کەمالی مەلا داود برای فاتح جەباری دوای تەواوکردنی کۆلێژی بازرگانی پەیوەندی دەکات بە حیزبی شیوعیی عێراقەوەو دواتر دەکرێت بە بەرپرسی هێڵی ئەعزەمییە. لە ساڵی (١٩٦٣) لە بەغداد هەڵدێتو خۆی دەگەیەنێتە کوردستانو لە کلکەسماق جێگیر دەبێت، بەڵام دوای چەند ساڵێك بە نهێنی دەگەڕێتەوە بەغدادو لەوێ لە کارگەیەکی دروستکردنی شەربەتدا وەك کرێکار کار دەکات. ئەو کارگەیە موڵکی پیاوێکی نەجەفی بوو. دواتر لە ساڵی (١٩٧٠)دا دوای ئەوەی بەعس ڕوو لە شیوعییەکان دەکاتەوەو فرمانی لێخۆشبوونیان بۆ دەردەکات هەندێکیان دەگەڕێنەوە بۆ کار ئەمیش دەکرێت بە بەڕێوەبەری کاروباری دەرەوە، تا لە ساڵی (١٩٧٥)دا خانەنشین دەکرێت.

٢١. (مذکرات الطبقجلي)، ناظم الطبقجلي، إعداد: جاسم مخلص.

٢٢. (العراق: الطبقات الاجتماعیة والحرکات الثوریة)، حنا بطاطو، ترجمة: عفیف الرزاز، الجزء الثالث.

٢٣. نفس المصدر، الصفحة ٢٠٢.

٢٤. نفس المصدر، الصفحة ٢٠٣.

٢٥. نیورك تایمز في (٢٩) نیسان (١٩٥٩).

٢٦. (الترکمان والوطن العراقي)، ارشد هرمزي، مؤسسة وقف کرکوك. الصفحة ٧.

٢٧. ڕۆمانی (عەلەبەستێ)، حەسەن جاف، کۆمەڵەی ڕووناکبیریی کەرکوك، کەرکوك، ٢٠٠٦.

٢٨. چەپکێك ڕەخنە لە کتێبی ئوستاد، نووسینی: مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای هەواڵ بۆ ڕاگەیاندنو ڕۆژنامەوانی، کەرکوك، ٢٠٠٥.

٢٩. (العراق دولة منظمة السریة)، حسن علوي.

٣٠ – حنا بطاطو.

٣١. (العراق دولة منظمة السریة)، حسن علوي، الصفحة ٢٦.

٣٢. حنا بطاطو.

٣٣. (هنري کیسنجر وإدارة الصراع الدولي)، أمین هویدي.

*** گرتنی مامەڕەزاو ڕەوتی هەقەکان بەرەو کەرکووك:-**

**مستەفا عەسکەری**

مامەڕەزا توانی کۆمەڵی هەقە زۆرتر بەرەو خۆخەریك کردن بە باری کۆمەڵایەتییەوە بەرێ. ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانی ئەو ناوچانەی باسمان کردن چوونە ناو کۆمەڵی هەقەوە یا بڵێین بوون بە هەقە. تەکیەو خانەقاکانیان لە جاران ناوەدان تر بوون، لە هەموو لایەك باس هەر باسی هەقە بوو، ڕێکەوت وابوو لەو سەردەمەدا شۆڕشی بارزانیش لە ساڵانی (١٩٤٣- ١٩٤٤)دا بەرپابوو، حکومەت بەرانبەر بزووتنەوەی هەقەیش مەترسیی زیاد کرد، لە ساڵی (١٩٤٤)دا مامەڕەزای دوورخستەوە بۆ عەمارە، ئەم دوورخستنەوەیە بە جۆرێکی وا کوتووپڕ بوو، مامەڕەزا لەوە بەولاوە کە داوا لە کۆمەڵەکەی بکا دوابەدوای ئەو برۆن و نەگەڕێنە دواوە تا حکومەت ناچار نەبێ ئەیگێڕێتەوە بۆ کەلکە سماق - فریانەکەوت هیچی تر بکا.

کەلکەسماق لەسەر ناوچەی میرزا رۆستەم بوو کە ئەو کاتە بە رانیەوەو رانیەیش بە هەولێرەوە بەسرا بووەوە، سەعید قەزاز موتەسەریفی هەولێر بوو هاتە دووکان و ناردی بەدوای مامە ڕەزادا بە ناوی چاوپێکەوتنەوە، کە مامەڕەزا گەیشتە سەر زێی دووکان، سەعید قەزاز چاوەڕوانیی نەکرد یەکسەر گرتی و سواری ئۆتۆمبیلەکەی خۆیی کردو ڕەوانەی عەمارەی کرد.

لەسەر داوای مامەڕەزا، هەقەکان ماڵ و سامان و خانووی خۆیانیان هەموو فرۆشت و لە ناوچەکانی خۆیانەوە بەرەو ناوچەی ئاغجەلەر بەرێ کەوتن، ماوەیەکی کەم لە دێی گۆپتەپە مانەوە تا هەموو یەکیان گرتەوە، ئینجا ڕووەو ناوچەی شوان بەرێ کەوتن بۆ ئەوەی لەوێوە برۆن بۆ کەرکووك، لە نزیك گوندی حاجی بەیخان لە ناوچەی شوان حکومەت ڕێی پێ گرتن و کاکە ڕەزای کاکە عەلیی عەسکەری و دوانزە کەسی تری لێ گرتن و ڕەوانەی کەرکووکی کردن، پێش ئەوانیش شێخ موحەممەد ئەمینی مەلحەو شێخ مستەفای کوری مامەڕەزا لە میرزا رۆستەم گیرابوون و ڕەوانەی رانیە کرابوون.

لە ماوەی ئەم ڕێگا دوورەدا پۆلیس هەر بەدوایانەوە بوون، جۆرەها ئازارو ئارەحەتی یان ئەدانێ و هەڕەشەیان لێ ئەکردن، بەڵام ئەوان هەر لەسەر ڕێ ڕۆیشتنەکەی خۆیان بەردەوام بوون تا گەیشتنە دێی یارەوەڵی، لەوێ بوون حکومەت بیری کردەوەو وردبووەوە ئەگەر ئەم ژمارە زۆرە لە پیاوو ژن و منداڵ ڕووبکەنە ناو شارەکان، بۆ ئەو ئەبێ بە مایەی شوورەیی.

لەبەر ئەوە کەوتە گفتوگۆ لەگەڵیان، لەلایەکی ترەوە گیراوەکان خرانە بەر گیروگازی ئیدارەو پۆلیس بە مەبەستی زۆرلێ کردنیان بۆ ئەوەی هاورێکانیان قایل بکەن بگەڕێنەوە دواوە بۆ دێهاتەکانی خۆیان، بۆ چاوەڕێ کردنی ئەنجامی ئەم گفتوگۆیەی هەقەکان لە ئۆردووگایەکی چۆڵی هاوینە کە بۆ مەشق پێ کردنی سەربازی حکومەت ئامادەکرابوو لە نزیکی یارەوەڵی ئارامیان گرت، موتەسەریفی هەر سێ لیوای هەولێرو کەرکووك و سلێمانی و بەڕێوەبەری پۆلیسی ئەم سێ لیوایە کۆبوونەوە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ کردنیان و، لەلایەکی دیکەشەوە بۆ دادگاییکردنی گیراوەکان، لە ئەنجامدا کە بۆیان نەچووە سەر گیراوەکان تاوانبار بکەن، گفتوگۆ لە نێوان هەردوو لادا گەرم بوو، بەڵام حکومەت هەر بە هیوای خافڵاندنی هەقەکان بوو، جۆرەها بەڵێنی ئەدانێ و هیچیشیانی بەجێ نەئەهێنا.

ساڵ بەرەو درەنگی ئەڕۆیشت و پایز بەسەردا هات و هەوا وردە وردە ساردی کرد، نەخۆشی کەوتە ناو ئۆردووگای هەقەکان، چەند پیرو منداڵیان لێ مردن و هەر لەو ئۆردووگایەدا بە خاك سپێردران، لە ئەنجامی ئەو بارودۆخەدا هەقەکان لەناو خۆیانا کۆبوونەوەیەکی گەورەی گشتی یان کرد، لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیاریان دا ئیتر چاوەڕوانی نەکەن، سەر لە نوێ ڕێ ڕۆیشتنەکەیان دەستی پێکردەوەو بەرەو کەرکووك کەوتنەڕێ، پۆلیس و ئۆتۆمۆبێلی چەکداری حکومەت ڕێ یان پێ گرتن و هەڕەشەیان لێ کردن ئەگەر نەگەڕێنە دواوە تەقەیان لێ ئەکەن، وەڵامی هەقەکان بەرانبەر بەم هەڕەشەیە ئەوەبوو ئەوان نایانەوێ بە زۆرەملێ بەربەرەکانێی پۆلیس و هێزی چەکدار بکەن، حکومەتیش هەرچی ئەکا با بیکا ، ئەمان ئەگەر تەنانەت هەموویشیان کوژراون ناگەڕێنەوە.

بەم جۆرە ڕێ ڕۆیشتنەکە هەر بەردەوام بوو تا لای ڕێی هەولێرەوە چوونە ناو شاری کەرکووك و لە نزیك ماڵی موتەسەریفەوە باریان خست.

شاری کەرکووك هەمووی بە مەسەلەکەی زانی و لێی تێ گەیشت، زۆر لە پیاوانی کوردی ناو شاری کەرکووك و خوێندەوارانی کەرکووك بەنهێنی پێوەندییان لەگەڵ ئەکردن و یارمەتییان ئەدان و لە ڕووی هەڵوێستی حکومەت و هەڵوێستی پێویست بەرانبەر بە حکومەتەوە گەلێ شتیان بۆ ڕوون ئەکردنەوە.

پاش چەند ڕۆژێ حکومەت خۆی بە ناچار بینی کەوا دالدەیەکیان بۆ پەیدا بکا بۆ ئەوەی لەو ڕێگاوە خەریکیان بکاو بییانخافڵێنێ و لەبەر چاوی خەڵکی شارەکەیش دەری بخا کەوا یارمەتی یان ئەداو ئەیانحەوێنێتەوە، چەند خانوویەکیان لە گەرەکی (زێویە) لەپشت چاپخانەکەی یادگارەوە لەسەر ڕێی کۆنی سلێمانی بۆ پەیداکردن، بەشێك لە ماڵەکان چوونە ناو ئەو خانووانەو ئەوانی تریشیان بە کۆڵانەکاندا بڵاوەیان لێکرد.

جارێکی تر سەرلەنوێ گفتوگۆ لە نێوان حکومەت و هەقەکانا دەستی پێکردەوە، وەك دەرئەکەوێ ئەمجارە حکومەت تەنگاو بوو شتێك بەدەستەوە بدا، پاش چەند ڕۆژێك گفتوگۆ، بەتایبەتی لەگەڵ گیراوەکان، ڕێك کەوتنێك ئەنجام درا، بریتی بوو لەم خاڵانەی خوارەوە:-

١- مامەڕەزا بگەڕێتەوە بۆ شاری سلێمانی و پاش گەرانەوەی هەموو هەقەکان بۆ ناوچەکانی خۆیان، ئەویش بگەڕێتەوە بۆ کەلکەسماق.

٢- بەندی و گیراوەکانی هەقەکان هەموو بەربدرێن.

٣- حکومەت ئەو زیانانەیان بۆ ببژێرێتەوە کە لێیان کەوتووە.

٤- شوێنێکیان لە ناوچەی ئاغجەلەر یا بیتوێن بۆ تەرخان بکرێ بۆ دانیشتن و خانوویان بۆ بکرێ و قوتابخانەو

نەخۆشخانەیان بۆ بکرێتەوەو زەوی وزار بخرێتە ژێردەستیان بۆ کشتوکاڵ کردن.

٥- هەقەکان بگەڕێنەوە دواوە بۆ ناوچەی شوان بۆ ماوەدان بە حکومەت تا خاڵەکانی سەرەوە جێ بە جێ بکا،

پاش ئەوەی نوێنەرانی هەردوولا ئەم ڕێکەوتنەیان ئەنجام دا، مامە سەلامی برای مامەڕەزا نێردرا بۆ عەمارە تا لەوێ چاوی بە مامەڕەزا بکەوێ بۆ ئەوەی بەندەکانی ڕێکەوتنەکەی بۆ باس بکاو وەڵامی ئەویش بهێنێتەوە بۆ ئەمان، بۆ چاوەڕوانی کردنی وەڵامی مامەڕەزا مۆڵەتی سێ ڕۆژ درا بە هەقەکان لە کەرکووك بمێننەوە، لە کۆتایی سێ ڕۆژەکەدا مامە سەلام فریانەکەوتبوو بگاتەوەو وەڵامێکی مامەڕەزا بگەیەنێتەوە ناو کۆمەڵەکە، لەبەر ئەوە ناکۆکی کەوتە ناویانەوە، هەندێکیان قایل بوون بە ڕێکەوتنەکەو بە سەرۆکایەتیی کاکە ڕەزای کاکە عەلیی عەسکەری گەڕانەوە بۆ ڕێدار لە ناوچەی شوان.

ئەوانی تریان بە ڕێکەوتنەکە قایل نەبوون و ئەیانگوت مەبەستی حکومەت هەڵخەڵەتاندنمانەو تا مامەڕەزا نەگەڕێتەوە ناومان، ناگەڕێینە دواوە، ئەم تاقمەیان لە کەرکووك مانەوە، پاش ئەوەی مامە سەلام گەیشتەوە ناویان و تێی گەیاندن کەوا مامەڕەزا بە ڕێکەوتنەکە قایلە، ئەوانیش گەڕانەوە بۆ ناوچەی شوان و بە دێهاتەکانا بڵاوەیان لێکرد، پاش سێ ڕۆژ ماوە درا بە مامە ڕەزا بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و دوای ماوەیەکی کەم لەوێیشەوە ڕەوانەکرا بۆ هەڵەبجەو دوایش نێردرا بۆ بیارە.

حکومەت ناکۆکیی ناو هەقەکانی بە هەل زانی بۆ پاشگەز بوونەوە لە جێبەجێکردنی خاڵەکانی ڕێکەوتنەکە، تەنها ئەوە نەبێ مامە ڕەزای گەڕاندەوە بۆ سلێمانی و لەوێوە ناردیە هەڵەبجەو گیراوە کانیشی بەرەڵلاکرد، کۆمەڵەی خەڵکەکەش بە ناچاری بە هەژاری و لێ قەوماوی بەرەودوا گەڕانەوە، بەشی زۆریان نانی شێویان نەبوو، بێ ماڵ و بێ خواردەمەنی و بێ دارایی هاتنەوە بۆ ناوچەکانیان بۆ ناو خانووی ساردو سڕ، ئەو کەسانەیان کە شتێکیان مابوو یارمەتیی ئەوانی تریانیان ئەدا، بەم جۆرە وردە وردە سەرلەنوێ دەستیان کردەوە بە کاسبی و ماڵ ڕێکخستنەوە، زۆری پێنەچوو بوونەوە بە خاوەنی زەوی و زارو مەڕو ماڵات، چونکە ساغ و پاك بوون، خەڵکی تری ناوچەکەیش یارمەتییان ئەدان.

دوای ئەم سەرەنجامەی ڕێ ڕۆیشتنەکە، کۆمەڵی هەقە تووشی نشوستییەکی گەورە بوو، ماوەیەکی زۆر کزو لاواز بوو، بەڵام هەقەکان گوێیان نەدایەو ریزی خۆیانیان تێك نەداو سەرلەنوێ دەستیان کردەوە بە ئاوەدان کردنەوەی تەکیەو خانەقاکانیان و لە ماوەیەکی کەمدا توانییان ریزی خۆیان وەك جاران ڕێك بخەنەوەو تەکیەو خانەقاکانیان گەرم بکەنەوە.

ڕێ ڕۆیشتنی هەقەکان بە چوون و گەڕانەوەوە سێ مانگێکی خایاند، هەر لە یارۆەلی ٢٥ ڕۆژ مانەوە، ئەم ڕێ ڕۆیشتنە لە مانگی ئەیلوولی (١٩٤٤)دا دەستی پێکردو لە کانوونی یەکەمدا دوایی هات.

*** چالاکی لێدانی قیتارە کە لە ساڵی (١٩٦٢):-**

حەسەن بارام

دوای ئەوەی حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسم لە پەیمان و بەڵێنەکانی لە بەرامبەر مافەکانی کورددا پاشگەزبووە، بەمەش نەوەستایەوە بەڵکو کەوتە جموجۆڵ بەمەبەستی لێدانی بزووتنەوەی کوردایەتی، ئیتر ئەم نیازە خراپەی قاسم و ڕژێمەکەی کوردی گەیاندە ئەو بڕوایەی کە بەغدا بەنیاز نییە هیچ ماف و داخوازییەکانی کورد بسەلمێنێ.

بۆیە لە ساڵی (١٩٦١)دا شۆڕشی ئەیلوول هەڵایساو شەڕ لەنێوان سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگەدا هەڵگیرسایەوە، سوپا پەلاماری زۆربەی ناوچەکانی کوردستانیداو لە بەرامبەردا هێزی پێشمەرگە کەوتە حاڵەتی بەرگری لە خاکی کوردستان و چەندین شەڕو بەرگری قارەمانانە دروستبوو.

ئیدی جەماوەری کوردستان هەڵوێستیان وەرگرت و زۆرترین خەڵك چوونە ریزەکانی هێزی پێشمەرگەوە بۆ بەرگریکردن لە خاك و نیشتیمان، بێ شك بەشێکی زۆر لە خەڵکی سنووری شاری خورماتوو و دێهاتەکانی دەورووبەری چوونە ریزی شۆڕشەوە، هەر بۆیە یەکەم چالاکی گەورەو گرنگی پێشمەرگانە لەم سنوورەدا ئەنجامدرا کە بە شەڕی (لێدانی قیتارەکە) ناسراوە لە مێژووی خەباتی کوردایەتیدا.

شەڕی لێدانی قیتارەکە لە نزیك وێستگەی (سلێمان بەگ) بووە لە باشووری شاری خوورماتوو لە ڕۆژی ١٥ی تشرین دووەمی ساڵی (١٩٦٢)دا.

لەو شەڕەدا نزیکەی (١٥٠) پێشمەرگەو هاوولاتی خۆبەخش بەشدار بوونە، کە بەسەرپەرشتی هەر دوو فەرماندەی ئەو دەمە (ڕەئیس کەمال. کەمال موفتی) (عادل عیزەت) بووە، جگە لەوەی قیتارەکە زیانی مادیی زۆری بەردەکەوێت زیانەکانی هەردوولا بەم شێوەیە بووە:-

١- کوژرانی دوو پۆلیس

٢- بە دیلگرتنی دەیان پۆلیس و ئینزیباتی سەربازی.

٣- دەسکەوت دەیان پارچە چەك و تەقەمەنی.

٤- شەهید بوونی پێشمەرگەیەك بەناوی (جوامێر) کە خەڵکی گوندی (باوە) بووە.

*** حەرەس قەومی باهۆزێکی ڕەش بوو لە ساڵی (١٩٦٣) لەگەڵ بەعسدا کەرکووکی کاول کرد**

**ئاکۆ خالید ئەحمەد**

حەرەس قەومی بە زمانی کوردی، واتە (پاسەوانی نەتەوەیی)، ڕێکخراوێکی سەربازیی هەوالگریی، سیاسیی، کۆنە پەرستی نەتەوەیی عەرەبو تیرۆیستی سەر بە حیزبی بەعس بوو، سەرەتا پاش ساڵی (١٩٥٩) لەلایەن بەعسییە نەتەوەییەکانەوە دروست بوو. لە کودەتای ٨ی شوباتی (١٩٦٣) بەدواوە کە لەلایەن چەند ئەفسەرێکی بەعسییەوە ئەنجام درا، حەرەس قەومییەکان بە ئاشکرا خۆیان دەرخستو لە ماوەی شەش مانگ کۆنترۆڵی گشت شارەکانی عێراقیان کردو باڵاترین دەسەڵاتی سەربازیو سیاسیی دەوڵەتی عێراق بوون.

بەرپرسی یەکەمی لە بەغدا بوو بە ناوی (عەلی سالح سەعدی) کە بەغدایی بوو، هەروەها (ئەحمەد ئەبو جبن) دەستی باڵای هەبوو لە بەغدا کە بەبێ دادگایی کردن دەیان کەسی لە گەرەکەکانی فەزلو ئەعزەمییەدا کوشت. بودجەیان بیست ملێون دیناری ئەو سەردەمەی عێراق بوو، کە سەنگی خۆی هەبووە وەکو دەڵێن لەلایەن دەزگایەکی هەوالگریی بیانییەوە ئەو پارەیەیان بۆ تەرخانکراوە. لە کۆتایی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٦٣) لە لایەن عەقید ڕوکن عەبدوسەلام عارف، کە سەرکۆماری عێراق بوو، هەرەسی پێهێندراو لە گشت ڕوویەکەوە کۆتایی بە دەسەڵاتیان هات لە هەموو ناوچەکانی عێراق. بەرپرسو ئەندامانی حەرەس قەومی چەکەکانیان تەسلیم بە پۆلیسو سوپای عێراق کردو خۆیان بە دەستەوە دا، بەشێکیان پەیوەندییان بە عەبدوسەلام عارفەوە کردو هەندێکیانیش چەکیان فڕێداو هەڵهاتن.

پاش کوودەتاکەی ٨ی شوباتی ساڵی (١٩٦٣) حەرەس قومییەکان کۆنترۆڵی شاری کەرکووکیان کرد، دامەزراوەیەکی توندرەوی سەربازیی شارەکانی (مووسڵو دەورووبەری‌و شەرگاتو تکریتو بەغدا) پێکهاتەی حەرەس قەومی بوون لە کەرکووك، کە جلوبەرگەکەیان ڕەنگی (زەیتوونیی سەربازی) بوو. پاشان ئەفسەرو گەنجە تورکمانە توندرەوەکان (تۆرانییەکان)ی کەرکووك پەیوەندییان بەو ڕێکخراوەوە کردو پلەی دەسەڵاتی بەرزیان وەرگرت. هەروەها ئەندامانی ئەو ڕێکخراوە تیرۆریستە - تۆرانییەکە بە شێوەیەکی نهێنی کاری دەکرد لە کەرکوك بۆ تیرۆرکردنی کەسایەتییە کوردەکان بە پاڵپشتیو هاندانی (نووری خەیات) کە بەڕێوەبەری ئەمنی کەرکووك بوو لەو سەردەمەو (ناظم تەبەقچەلی)ی سەرکردەی تیپی دووی سوپای عێراق لە کەرکووك لە ساڵانی (١٩٥٨ تا ١٩٥٩) پەیوەندییان بە حەرەس قەومییەوە کرد لە دژی کوردو بۆ ئەنجامدانی تاوانەکانیان بە ئاشکرا. (٨٥٪) حەرەس قەومیی کەرکووك تۆرانی بوون. ئەو چەکانەی بەکاریان دەهێنا (غەدارەو کلاشینکۆف)بوو. شوێنی مۆڵگەو بنکەکانی حەرەس قەومی لە شاری کەرکووك ئەمانە بوون.

١- مۆڵگەی سەرەکیی حەرەس قەومی لە کەرکووك لە (سەندیکای کرێکارانی نەوت) بوو لە گۆرەپانی کرێکاران کە ئێستا شوێنی بارەگای لقی ٣ی پارتی دیموکراتی کوردستانە. هەیکەلی سەرکردایەتییان لەلایەن ئەم ناوانەوە سەرپەرشتی دەکرا.

أ- بەرپرسی سەرەکی بەعسییەکی بەغدایی بوو. بەڵام (عەقید ئیبراهیم ئەلراوی) سەرکردەی سەربازیی تیپی دووی سوپای عێراق لە کەرکووكو لێپرسراوی مەدەنیی لیوای کەرکووك، دەستی باڵای هەبوو لەگەڵ حەرەس قەومی‌و یەکەم پیلاندانەری تاوانەکانیان بوو.

ب- عەقید عەبدوڵڵا عەبدولرەحمان تۆرانی بووە پەیوەندیی باڵای ڕاستەوخۆی لەگەڵ مۆڵگەی سەرەکیی حەرەس قەومی هەبوو، یەکێکە لە پیلاندانەرانی کارە تیرۆریستییەکانی حەرەس قەومی لە کەرکووك، ئەم عەقیدەی حەرەس قەومی باوکی (فاروق عەبدوڵڵا عەبدولرەحمان)ە، کە ماوەیەك سەرۆکی جەبهەی تورکمانی بووە لە کەرکوك، کە دواتر لە لایەن ڕژێمی بەعسی ڕووخاوەوە لە ناوەراستی ساڵانی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو بە تاوانی پەیوەندی کردنی لەگەڵ دەوڵەتی تورك، لە سێدارە دراوە.

٢- مۆڵگەیەك لە بەشی شارەوانیی (قەڵا) کە ئێستا شوێنی یانەی (سۆلاف دووە) لە لای چەپ بەرامبەر قەڵای کەرکووك، بۆ سەرپەرشتی کردنی گەرەکەکانی (بلاغ، ئیمام قاسم، بەرتەکیە، ئازادی، زێوێ، حەسیرەکە، ئاخور حوسێن)، ئەم ناوانەش لەو مۆڵگەیەدا بەرپرس بوون.

أ- (حەمید) ناوێك دانیشتووی قەڵای کەرکووكو تۆرانییەکی توندرەو بوو، بەرپرسی یەکەمی مۆڵگەی بەشی شارەوانیی قەڵا بوو.

ب- (خەلیل ئاغا) موختاری قەڵای کەرکووك، کە تۆرانییەکی توندرەو بوو.

ج- (ئەحمەد چەلەبی)، تۆرانی‌و (پیاوێکی بە ساڵاچوو) بوو تەمەنی (٦٠) ساڵ زیاتر بووە تەنها بۆ دژایەتی کردنی کورد بووەتە حەرەس قەومی.

٣- مۆڵگەیەك لە بەشی شارەوانیی (موسەڵلا) لە بەرامبەر بنکەی پۆلیسی پیریادی بووە، بۆ سەرپەرشتی کردنی گەرەکەکانی (پیریادی، موسەڵلا، قەسابخانە، جووت قاوە، گشت گەرەکەکانی شۆریجە). بەرپرسو گشت ئەندامو چەکدارەکانی حەرەس قەومی لەو مۆڵگەیەدا لە تۆرانییەکان بوون.

٤- مۆڵگەیەك لە کۆمپانیای نەوتی کەیوان بوو، ئێستا شوێنەکەی لەناو کۆمپانیای نەوتە لە کەرکوك، بۆ سەرپەرشتی کردنی کۆمپانیای نەوت تا دەگاتە قەزای دووبز، سەباح بەیاتی کە مامۆستاو بەرپرسی ئەو مۆڵگەیە بووە، بەعسییەکی توندرەو بووە.

زۆربەی هەرە زۆری ئەندامو چەکدارەکانی حەرەس قەومی لە مۆڵگەکانی کەرکووك گەنجە تۆرانییەکان بوون، کە بە چەکی غەدارەوە لەناو گەرەکەکانی شاری کەرکووك بۆ ترساندنو هەراسانکردنی خەڵکی بێ دەسەڵات دەسووڕانەوە.

بەشێکی دوژمنکارییەکانی حەرەس قەومی لە شاری کەرکووكو دەورووبەری ئەمانەن:-

أ– گرتن‌و هەراسان کردن‌و راوەدوونانی ئەندام‌و لایەنگرانی پارتی دیموکراتی کوردستان‌و حیزبی شیوعیی عێراق‌و کوردە بێ لایەنەکان، یان هەر کەسێ کە کورد بێت‌و، راپێچکردنیان بۆ مۆلگەی سەرەکیی حەرەس قەومی لە سەندیکای کرێکاران (شوێنی لقی ٣ی ئێستا) پاشان لەوێوە بۆ گرتووخانەی سەربازی لە تیپی دووی سوپای عێراق (شوێنی فەیلەقی کۆنی ئێستا) بۆ ئازارو ئەشکەنجەدانیان.

ب– سووتاندنی ژمارەیەکی زۆر لە ماڵە کوردەکانی کەرکووك، لە وانە ماڵی (عەبدوڵڵا دزەیی) لە گەڕەکی زێوێ.

ج– وەرگرتنی سەرانەو باج لە کوردی کەرکووك بەناوی (تەبەروع) بۆ حەرەس قەومی کە (٢٥٠فلس) بە سەرەوە بێت، ئەو پارەیەش لەو سەردەمە سەنگی خۆی هەبووە.

د– تێکدان‌و سووتاندنی گوندەکانی (سۆنەگۆلی، یاروەلی، پەنجا عەلی، وەلی پاشا، قزلقایە، چیمەنی گەورەو بچووك، جەوەل بۆر، قووتان، قوشقایە، شۆراوو باجوان)و دەربەدەر کردنی خەڵکەکەی.

هـ– تێکدان‌و سووتاندنی گشت گوندەکانی سەر بە قەزای دووبز وەکو (قەرەدەرە، عەمشە، مەرعی، قەڵا مەربەت، کتکە، قوتانی خەلیفە، قوتانی کوردەکان، سێکانیان، گورگەچاڵ، شێخان، نادراوا، دەرگەی کوردەکان، قەرەهەیبە، عەلەغێر، مامە، شیرناو، تەقتەق، کونەرێوی، چەخماخەو مەڵحە)و دەربەدەرکردن‌و ماڵوێرانکردنی دانیشتووانی ئەو گوندانە. پاشان ئەم گوندانەش بەر شاڵاوی وێرانکاریی حەرەس قەومی کەوتن: (جاستانە، دەربەند، پەلکانە، عەلەخان، تەل هەڵاڵە، گەزوەشان‌و گەراو) لەگەڵ وێرانکردنی ئەو گوندانەی کە هەموو سەر بە قەزای دووبزن، هۆزە عەرەبە گەرۆکەکان (بەدو)ی هێناوە بۆ نیشتەجێکردنیان لە شوێنی دانیشتووانی کوردی ئەو گوندانە، بە مەبەستی بە عەرەب کردنی دەڤەرەکە، بە سەرۆکایەتیی (عەواس سەدیر) تا راگەیاندنی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ ئەو هۆزە عەرەبە هەر لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون.

لە سەرووی هەمووی ئەو کردەوە تیرۆریستی و دوژمنکارییانەی لە دژی کوردی کەرکووك ئەنجام درا، ئەویش تێکدان‌و خاپووورکردنی گەڕەکی کۆماری (جمهوری) لە کەرکووك، کە بە هاوتا لەگەڵ ئەلسەورەی بەغدا دروست کرا، بەڵام (مەدینە سەورە)ی بەغدا مایەوەو ئێستا یەکێکە لە گەڕەکە هەرە گەورەکانی بەغدا.

لەپاش شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ خەڵکی هەژارو کەم دەرامەتی کەرکووك کەوتنە دروستکردنی خانوو بۆ خۆیان، ئەویش بە شێوەیەکی زۆر سادە (قوڕو خشت) لەبەر بێ شوێن‌و بێ جێگەیی و بە ناچاری. گەڕەکی کۆماری لەپشت گۆڕستانی شێخ محێدین)ەوە دەستی پێدەکرد تاکو گەڕەکی شۆڕیجە، ئێستا تا نزیك یاریگای ئۆلۆمپی کەرکووك بە هێڵی ڕاست هەموو زەوییەکان موڵکی شارەوانیی کەرکووك بوون، تاکو ئێستاش هەر موڵکی شارەوانین.

هەر لە سەرەتاوە تۆرانییەکان بەدەستەکانی دەزگا حکومییەکانی کەرکووك داوایان دەکرد ئەو گەڕەکە خاپوور بکرێت، پۆلیس‌و شارەوانییان هان دەدا بۆ ڕووخاندنی ماڵەکانی ئەو گەڕەکە. (مەجید چایەچیی هەمەوەند) وەك کەسایەتییەك بە نوێنەرایەتیی دانیشتووانی گەڕەکی کۆماری دووجار چاوپێکەوتنی لەگەڵ زەعیم ڕوکن (عەبدولکەریم قاسم) کردو یاداشتنامەی بەناو ئەو خەڵکە هەژارو کەم دەرامەتەوە پێشکەش کرد، بۆ ئەوەی دەستکاریی ئەو گەڕەکە نەکرێت. پاشان عەبدولکەریم قاسم نووسراوی ئاراستەی دەزگای پۆلیس‌و شارەوانیی کەرکووك کرد کە پەیوەندییان بەو گەڕەکەوە نەبێت چونکە خەڵکەکەی هەژارو کەم دەرامەتن، بەڵام تۆرانییەکان هەر بەردەوام بوون‌و هەمیشە هەوڵیان دەدا بۆ خاپوور کردنی ئەو گەڕەکە.

پاش ئەوەی حەرەس قەومی دەسەڵاتی شاری کەرکووکیان گرتە دەست‌و تۆرانییەکان بوونە سەرکردەو کاربەدەستی حەرەس قەومی. یەکسەر داوای خاپوور کردنی گەڕەکی کۆمارییان لە عەبدولسەلام عارف کرد، پاشان ئەویش سەردانی کەرکووکی کرد ڕەزامەندیی خۆی نیشاندا کە ئەو گەڕەکە تێك بدرێت، کە لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٦٣) کارەکە کراو بەم شێوەیە:-

١– لە ماوەی دوو شەودا تەنها بە شەویش هەموو دانیشتووانی گەڕەکی کۆماری بە (لۆری) لەلایەن حەرەس قەومییەوە گواسترانەوە بۆ دەربەندی بازیان، لەوێش بەو خەڵکە لێقەوماوەیان ڕاگەیاند کە بۆ هەر شوێنێك دەچن بچن بەڵام نابێت بۆ کەرکووك بگەڕێنەوە. دواتر بەشێك لەو خەڵکە ماڵوێرانە بەرەو گوندەکان چوون، بەشێکی تریان بە شاراوەیی گەڕانەوە بۆ ناو شار بۆ ماڵی خزم‌و کەسیان.

٢– لە ماوەی دوو ڕۆژدا گشت خانووەکانی گەڕەکی کۆماری (جمهوری) لە گۆڕستانی (شێخ محێدین)ەوە تاکو یاریگای ئۆلۆمپیی کەرکووکی ئێستا لە گەڕەکی شۆڕیجە تێك دران‌و ڕمایە سەر هەموو ئەو کەلوپەلانەی لەناو ماڵەکاندا بوون‌و لەگەڵ زەوی تەخت کران. ئەمە یەکێکە لەو گەورە تاوانانەی لە مێژووی کەرکووك‌و لە مێژووی مرۆڤایەتی کراوە کەوا لە دژی کورد ئەنجامیان داوە، ئەم تاوانەش جگە لە بڕیاری عەبدولسەلام عارف، کە ڕەزامەندیی لەسەر داوە، بەڵام ئەمانەش لەگەڵ حەرەس قەومی ئاسانکارییان کردووە بۆ جێبەجێ کردنی ئەو تاوانە:-

١– سەرکردەی تیپی دوو و بەرپرسی حەرەس قەومی لە کەرکووك ئیبراهیم ئەلراوی.

٢– بەڕێوەبەری ئەوکاتەی شارەوانیی کەرکووك (حوسامەدین ساڵحی) کە تۆرانی بووە.

٣– عەقید عەبدوڵڵا عەبدولڕەحمان بەرپرسی حەرەس قەومی لە بارەگای سەرەکی لە (نەقابەی کرێکارانی نەوت).

٤– بەرپرسی پۆلیسی کەرکووك‌و بەڕێوەبەری ئەمنی کەرکووك.

هەروەها گشت ئەندام‌و چەکدارەکانی حەرەس قەومی لە کەرکووك بەشداریی ڕاستەوخۆیان لە گشت روویەکەوە کرد. لە گواستنەوەی خەڵکەکە بۆ دەربەندی بازیان‌و تێکدانی خانووەکان. هەر وەکو باس دەکرێت تۆرانییەکان چەندین ئاهەنگیان بەو بۆنەیەوە گێڕا.

ئەو شۆفەلانەی بەشدارییان لە تێکدانی خانووەکاندا

کرد سەر بە تیپی دووی سوپای عێراق بوون نەك سەر بە شارەوانیی کەرکووك واتە شۆفەلی سەربازی بوون، چونکە ئەو سەردەمە شارەوانیی کەرکووك شۆفەلی نەبووە.
هەرچەندە ماوەی حوکمرانیی دەسەلاتی حەرەس قەومی کەم بوو، لە ٨ی شوباتەوە تا کۆتایی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٣، بەلام گورزێکی کوشندەیان لە کوردی کەرکووك وەشاند کە تا ئێستاش ئاسەواری هەر ماوە لەناو دانیشتووانی و باجەکەی دەدەنەوە.
پاش هەرەسهێنانی حەرەس قەومی دەمودەست ئەو دارودەستانە پەیوەندییان بە تاقمی عەبدولسەلام عارف کرد بۆ بەردەوام بوونیان لە دژایەتی کردنی کورد لە کەرکووك.
لەم نووسینەدا چەندین زانیاریی ڕاستەقینەم روون کردەوە کە بە ئەمانەتەوە وەرم گرتوون و بۆ یەکەم جار بلاو دەکرێنەوە. مەبەستی من هیچ جۆرە توندرەوییەکی تێدا نییە یان مەبەستم تاوانبار کردنی نەتەوەیەك بێت ئاماژەیان پێ بکرێت و باوەڕیش ناکەم برایەتیی نێوان نەتەوەکانی کەرکووك وا بە ئاسانی تێك بدرێت، چونکە حەرەس قەومی و حەرەس جمهوری و حەرەس خاسی سەدام نەیانتوانی کەلێن دروست بکەن و برایەتیی نێوان کوردو تورکمان و کلدان و ئاشووری و عەرەبە رەسەنەکانی کەرکووك تێك بدەن، بەلکو هەر لە گەشەکردن و بەردەوامی دەبێت، ئەو باندو تاقمانەی دوژمنایەتیی کورد دەکەن پەیوەندییان کردووەو بوونەتە بەرپرس لە هەر دەزگا یەك لە دژی کورد بێت، مەبەستیان تەنها دژایەتی کردنی کورد بووەو هیچی تر نا، لەوانەیە رۆژێك بێت ئەو بەرەو دەزگایانەی دژایەتیی کورد دەکەن نەمێنن و هەرەس بێنن.

* **سەرچاوەکان:-**
- منطقة كركوك ومحاولات تغيير واقعها القومي، د. نوري الطالباني، لندن ١٩٩٥.
- کەسایەتیی ناسراوی کەرکووك بەرێز (نووری فەقێ).

## * کەرکوك لەنێوان ساڵانی ۱۹٦۸ - ۱۹۷۷ دا
د. پشکۆ ئاغجەلەری

### * بەیانی ۱۱ ی ئازاری ۱۹۷۰ و دۆزی کەرکوك

بە کودەتایەکی سەربازیی رژێمی (عەبدولرەحمان عارف) لە(۱۷ی گەلاوێژی ساڵی ۱۹٦۸)دا رووخێندرا، ئەنجوومەنی نوێی فەرماندەیی شۆرش کاتژمێر(۷)ی سەرلەبەیانی تەواوی دەسەڵاتی گرتە دەست و بەتێکرای دەنگ، جێگری پێشووی سەرۆککۆمار و گەورە ژەنەراڵی خانەنیشین (ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر) یان وەك سەرۆکی عێراق هەڵبژارد.

جەنگیش جارێکی تر لە دژی کوردەکان لە بەهاری ساڵی ۱۹٦۹وە پەرەی سەندەوە و لە مانگی چواری هەمان ساڵدا، چەند شەرێکی زیاناوی روویاندا بەتایبەتی لە ناوچەکانی کەرکوك و هەولێر، لەو کاتەشدا هەولێك لەلایەن (ئەحمەد حەسەن بەکر و سەددام حوسێن)ەوە هەبوو بۆ دانووستان لەگەڵ سەرکردایەتیی کورددا. بێگومان رووداوێکی لەو جۆرە و گۆرانی هەڵوێستی بەعس و بریاردان بۆچوونە نێو گفتوگۆکە دواتریش پەیماننامەی (۱۱ ی ئازاری ساڵی ۱۹۷۰) ی لێکەوتەوە، کۆمەڵێك هۆکاری بابەتی و خۆیی رۆڵی تێدا بینیبوو و رووداوێکی کتوپر نەبوو، بەڵکو ئاکامی ئەو بارودۆخە ناهەموارە بوو کە پارتی بەعسی سۆسیالیستی عێراق پێیدا گوزەری دەکرد، هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا بزووتنەوەی کوردیش دووچاری کۆمەڵێك قەیران ببوو. واتە کۆمەڵێك هۆکاری نێوخۆیی و دەرەکی هاندەربوون، بۆ دانووستاندن و دەرکردنی بەیانی (۱۱ی ئازاری ساڵی ۱۹۷۰) لەوانەش:

یەکەم: بەهێزیی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد و لێدانی دامەزراوە نەوتییەکانی کەرکوك: لە شەستەکان وسەرەتای هەفتاکانی سەدەی بیستەمدا، پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی مستەفا بارزانی شۆرشێکی دژی حکومەتی بەغداد لەپێناوی خودموختاری بۆ کوردی باشووری کوردستان بەرپاکرد. شۆرشی کورد لە ساڵی (۱۹٦۱)ەوە دەستپێکرد و بەدرێژایی شەستەکان شەر لەنێوان هەردوولا (کوردو حکومەتی عێراق) بەردەوام بوو، هەرچەندە ساڵی ۱۹۵۸ حکومەت دانی بەبوونی نەتەوەی کورددا لە دەستووری کاتیی عێراقدا نابوو، بەڵام دەسەڵاتدارانی عێراق ترسی ئەوەیان لێ نیشتبوو کە لەوانەیە سەرکەوتنەکانی کورد ببنە هۆی داگیرکردنی ناوچەی کانە نەوتییەکانی دەورووبەری کەرکوك. لەبەر ئەوەی کاتێك بەعسییەکان چوونەسەر دەسەڵات، ئەوکات بزووتنەوەی کورد، لەوپەری بەهێزیدا بوو. بۆ نموونە: کاتێك لە ئازاری ۱۹٦۹دا رژێمی بەعسی عێراق بەهێزێکی (٦۰) هەزار کەسییەوە هێرشیان کردە سەر کورد، کە سوپای عێراق بەتازەترین کەلوپەلی جەنگی پر چەك کرابوون، کەچی نەیتوانی بەسەر لەشکری شۆرشگێرانی کورددا کە ژمارەیان دەگەیشتە (۳۰)[1] هەزار پێشمەرگە سەربکەوێت.[2] لەلایەکی ترەوە رۆژ بەرۆژ بەهێزی پێشمەرگە باڵای دەکردو لە سەرکەوتن و بەرەوپێشچووندا خۆی دەنواند و دەسەڵاتی نێوەندی بەعسیش بەردەوام لەو سەرکەوتنانەدا خۆی پێ نەدەگیراو داوای ئاگر بەست و گفتوگۆی لەسەرکردایەتیی شۆرش کرد[3]. لەو کاتەدا گۆڤاری (الثورة العربیة) لە لێکۆڵینەوەیەکدا ئەو راستییەی خستەروو، کەبەعسییەکان دانیان بەوەدا نا، کە بزووتنەوەی شۆرشگێری کورد بەهێزەو دەبێت دانووستانیان لەگەڵ بکرێت[4].

دوای باڵادەستی سەربازیی شۆرشگێرانی کوردلە کوردستاندا، پێشمەرگە دەستپێشخەری کردو هەڵمەتێکی دەستپێکرد و شەرەکەی لە ناوچەکانی خۆیدا دەکرد[5] و بریاری هێرشکردنی بۆ سەرداموودەزگاکانی حوکمی و نەوتییەکانی کەرکوکیدا، رابەرانی کورد بریاریاندا دامودەزگای (کۆمپانیای نەوتی عێراق) بتەقێننەوە، بەڵام رادەی زیانەکە لە سنوورێکی دیاریکراودا بێت، دیارە مەبەست لە هێرش بۆ سەر کەرکوك وێرانکردنی دەزگا نەوتییەکان نەبوو، بەڵکو گەیاندنی پەیامێك بوو، تا کار بەدەستانی بەغداد بزانن ئەگەر سووربن لەسەر ئەوەی بە پارەی نەوت چەك بکرن، ئەوا سەرچاوەی دەرامەتەکەیان کە لەو سەروبەندەدا مانگانە دەگەییە دە ملیۆن دۆلار، دەکەوێتە مەترسییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پەیامە بۆ کاربەدەستانی (کۆمپانیای نەوتی عێراق)یش بوو[6]. سەرەنجام پاش یەکەم هەوڵی کورد بەمەبەستی وەدەستخستنی زانیاریی لەرۆژی (۲٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹٦۸) دا(سامی عەبدولرەحمان) کرایە فەرماندەی هێرشەکە و لە(۲۳ی شوباتی ساڵی ۱۹٦۹) دا دەستەیەکی (۲۰۰) کەسیی پێشمەرگە بەسەد هێستر و شەش هاوەن و (۲۰۰) گوللە هاوەنییان بردە شوێنە دیاریکراوەکان و پاش ئەوەی لە هێڵی هێزەکانی عێراق تێپەرین، لە کاتژمێر(۸:٤۷)ی شەوی یەکەمی مارسدا، یەکەم هاوەنیان هاویشتە بنکەکانی (کۆمپانیای نەوتی عێراق) لە باکووری رۆژئاوای کەرکوك. پاش ئەوەی نزیکەی (۱۰۰) گوللە هاوەنییان بەشوێنە دیاریکراوەکانەوە نا، بەبێ ئەوەی هیچ بەربەستێك لەسەر رێگەیاندا بەدی بکرێت گەرانەوە و زیانێکی بەرچاویان لە کۆمپانیای نەوتی عێراق دا، کەبەبری (۲) ملیۆن دۆلار دیاریکراو کۆمپانیا ناچاربوو بۆ ماوەی یەك مانگ بەرهەمهێنانی بەبری (۷۰٪)دابەزێنێت، دەوڵەتی عێراقیش بێ دەنگی لەو هێرشەکرد[7]. پاش شیکارکردنی ئەنجامەکانی هێرشەکەو سەرنجدانی لە هێزی جەنگاوەرەکانی کوردو لە ترسی کەوتنە نێو گێژاوێکی قووڵەوە، بۆیە پەنای بردە بەر شێوازی دانووستانکردن سەرباری ئەوەی کە بەشێك لەسەرکردە سەربازییەکان بەرهەڵستی ئەو بریارە بوون، بەڵام (سەددام) پێداگری کرد لەسەر پێویستی گەیشتنە رێککەوتنامەیەك[8]، لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆرشی کورددا.

کەواتە بریاری دانووستان لەگەڵ کورددا لای بەعسییەکان لەسەر بنەمای هیچ جۆرە پابەندبوونێك بەرامبەر مافەکانی کورد دانەمەزرا بوو، بەڵکو لەسەر بنەمای بەهێزکردنی هەڵوێست و پێگەی خودی بەعس بنیاتنرابوو، دەیویست بەو شێوەیە ئەو هەرەشەیەی کە لەوانەبوو لەلایەن بزاڤی

رزگاریخوازی کوردەوە رووبەرووبێتەوە، پووچەڵ بکاتەوە. کەواتە کوردیش ئەوەندەی لایەنگیرهەبووە، کە باروپێگەی بەعسییەکان بخەنە بەرهەڕەشە و بۆ رێککەوتن ناچاری بکەن.

دووەم: گوشار ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتییەکانی سەربە بەعس: لەدوای کودەتای گەلاوێژی ساڵی ١٩٦٨، حکومەتی بەعسی عێراق کەوتە بەر گوشاری زۆری (ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی و..تاد... ) کە ناچاربوو لەژێر ئەو گوشارانەدا پەنا بۆ وتووێژ ببات لەگەڵ بزاڤی رزگاریخوای کورددا[٩]. بۆ نموونە: حکومەتی بەعس لەو کاتەدا لە قەیرانێکی دارایی گەورەدا بوو، نەیدەتوانی قیستی ئەو قەرزە دەرەکی و سوودانە بداتەوە، کە رۆژانە (٧٥٠)هەزار دۆلار بوو[١٠]. هۆکاری ئەو قەرزکردنەش بۆ جەنگەکانی کوردستان بوو. بەو جۆرە جەنگ ئابووریی عێراقی دارزاند[١١]. لەلایەکی ترەوە خراپیی بارودۆخی ئابووری و دارایی رژێمی بەعس وایکرد حکومەت نەتوانێت دەزگاکانی دەوڵەت کۆنترۆڵ بکات و نەیاری زۆری هەبوو بەتایبەت لەسوپا و هێزەکانی پۆلیس و ئاسایشدا[١٢].

هۆکاری تر بۆ دانووستان ورێککەوتن لەگەڵ کورددا، لاوازیی پێگەی بەعس بوو لەنێو کۆمەڵدا بەرلەپەیماننامەی ١١ی ئازار، بەبەڵگەی ئەوەی لە راپۆرتی سیاسیی هەشتەمی کۆنگرەی هەرێمایەتی حیزبی بەعسدا هاتبوو، بەیاننامەی ١١ ئازار بایەخێکی گەورەی هەبوو، بۆ پتەوکردنی لایەنی مەعنەوی و رۆڵی بەعس لەنێو کۆمەڵدا[١٣]. کەواتە بەعس دەیویست لەو رێگەیەوە بەشێوەیەکی تاکتیکی پێگەی سیاسی و جەماوەری خۆی بەهێز بکات، کورد رابکێشێت بۆ نێو دەسەلات و هەرەشەی سیاسی لەسەر چارەنووسی نەهێڵێت[١٤]. بەم جۆرە دانووستان و پەیماننامەی ١١ ئازار لای بەعس، لە ئەنجامی ئەو گوشارە (ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی و...تاد... )یەوە، کە لەسەری بوو لەپێناوی دەربازبوون لەو تەنگژەیەی تێیدابوو، بۆ ئەوەی پتر بپەرژێتە سەر جێبەجیکردنی نەخشەکانی خۆی، ناچار هەندێك گۆرانکاریی کرد، تا وەك هەر رژێمیکی فاشی بتوانێت بنکەیەکی ئابووری و کۆمەلایەتی بۆ خۆی ساز بکات ورای گشتی نێوەوە و دەرەوەش بەلای خۆیدا رابکێشێت.

سێیەم: ململانێی نێوان باڵی مەلایی (بارزانی) و باڵی مەکتەبی سیاسی (ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی): سەرەتا رژێمی نوێی بەعس، بەهیوا بوو یەکێك لە باڵە ناکۆکەکانی نێو بزووتنەوەی کورد بەسەر باڵەکەی دیکەدا زاڵ بێت[١٥]، لەبەر ئەوە نیازی خۆی بەجێبەجێکردنی بەندەکانی بەزاز راگەیاند و روویکردە باڵی مەکتەبی سیاسی و بەڵێنی پێدان و ئەوانیش ئامادەی هاوکاری بوون و ئایدۆلۆژیای سۆسیالیستییان هەبوو، بەمسۆگەری وای دادەنا بەوکارە دەتوانێت باڵی سەربازیی بزووتنەوەی کوردی، پێ ئابووبد بکات. سروشتییش بوو باڵی مەکتەبی سیاسی پێشوازی لە رژێمی تازەبکەن، لەرووی ئایدۆلۆژییەوە دەیانتوانی ئاسانتر لەهەر رژێمێکی تر هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەن، چونکە ئەوانیش باوەڕییان بە بنەماکانی سۆسیالیزم و نەتەوەیی هەبوو، سەرباری ئەو هاوکارییە بۆ لاوازکردن و دەرپەراندنی مستەفا بارزانی بوو لە پێگەکەی[١٦]. لەلایەکی تریشەوە مستەفا بارزانی دەیویست کە شەڕ لەگەڵ حکومەتی بەعسدا بوەستێنێت، ئەمەش بۆ ئەوەی دەستوالا بێت بۆ پاکسازیکردنی چەند لایەنێکی بەرهەڵستکار لە کوردستاندا، بەتایبەتی باڵی مەکتەبی سیاسی کەبانگەشەی ئەویان دەکرد، کەئەوان درێژکراوەی پارتی دیموکراتی کوردستانن و بەهاوکاریی لەگەڵ حکومەتدا لەچەندین هەڵمەتی چەکدارانەدا لەگەڵ باڵی مەلایی پارتی دیموکراتی کوردستاندا رووبەڕووبوونەوە[١٧]. لەبەر ئەوەش مستەفا بارزانی پێشنیارەکەی بەعسی بۆ دانووستان رەت نەکردەوە، بەڵام سووربوو لەسەر ئەوەی کە هاوکاری ئەو لەگەڵ بەعس بەمەرجی نەهێشتنی پێوەندیی حکومەتە لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی[١٨].

هەروەها سەرکردایەتیی شۆرشی کورد هۆکارێکی تری خۆیان هەبوو بۆ ئەوەی دانووستان و رێککەوتن بێتە ئاراوە، لەوانە: ئازاری ئەو زیانە گەورانەی شۆرشی کورد لە سەرەتای هەڵایسانی شۆرشی ئەیلوول لە ساڵی ١٩٦١ چەشتبووی، بۆیە دۆزینەوەی رێگەچارەو دەربازبوون لەو کارەساتانە، بارزانی خستەبەردەم بەرپرسیارییەتی گەورەرەوە[١٩]. لەگەڵ ئەوەشدا لەنێوسەرکردایەتیی شۆرشی کورددا، بەشێك لەگەڵ وەستاندنی شەڕ بوون و دەیانگوت:" پێشمەرگە ماندووبووەو تاقەتی لەشەڕچووە"، کۆمەڵێکیشیان پێیان وابوو تەنیا ئەمریکا و بەرەی رۆژئاوا سوود لەو شەرە وەردەگرن، جگەلەوەش سەرکردایەتیی پارتی خاوەنی پرۆگرامێکی رێکوپێك نەبوو[٢٠]. کەواتە ململانێی نێوخۆیی کورد و درێژەکێشانی شەڕ و نەبوونی پلانێکی باش لەلای سەرکردایەتیی کورد، هۆکارێك بوو بۆ چوونە نێو دانووستاندن.

چوارەم: ململانێی نێوخۆی پارتی بەعسی سۆسیالیستی – عێراق: سەرکردەکانی بەعس، کە هەندێکیان لە تێروانینی واقعی گەلی کوردەوە و هەندێکی دیکەیان لە ترسی هۆکاری لەقکردن ورووخاندنی رژێمی بەعس ناچاربوون وەك پلانێکی تەکتیکی دانووستان لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆرشی کوردبکەن[٢١]. بەڵام یەکێك لەو هۆکارە بەهێزانەی بەیانی ئازاری دروستکرد، پەیدابوونی ململانێیەکی شاراوە بوو لەنێوخۆی سەرکردایەتیی پارتی بەعسی دەسەڵاتداردا و بەشبوونیان بۆ دووبەش، باڵی مەدەنی بەسەرکردایەتیی (ئەحمەد حەسەن بەکر و سەددام حوسێن)و باڵی سەربازیی بەسەرکردایەتیی (عەبدولخالق سامەرایی و نازم گزار)، کە باڵی سەربازیی بەعس پێیان وابوو دەتوانن کێشەکانیان لەگەڵ کورددا لە رێگەی شەڕەوە چارەسەر بکەن و بەپێچەوانەی باڵی مەدەنییەوە، کە لەگەڵ ئاشتی و چارەسەرکردنی دۆزی کوردبوون، ئەمە تارادەیەك بووە هۆی لاوازی لەنێوخۆی دەسەڵاتدا[٢٢]. لەوکاتەدا حیزبی بەعس نەیدەویست لەدوو بەرەدا خۆی خەریك بکات و پتر لاوازبێت، هەولیدا دۆزی کورد بەشێوەیەکی کاتیی چارەسەربکات، تاشوێن پێی خۆی قایم بکات و گرووپەکەی سەددام دەست بەسەر حیزبدا بگرێت

وئەوەی ساڵی ١٩٦٣ رووییدا جارێکی تر روونەداتەوە. هەرچەندە رابەرانی بەعس دان بەو راستییانەدا نانێن، کە لە دۆخێکی نائاسایی حیزبدا ئەو بڕیارەیان دەرکردبێت، هەروەك سەددام حوسێن، دەڵێت:" پێویستە تێبگەین کە کێشەی نەتەوەیی بەشێوە و لە چوارچێوەی ئۆتۆنۆمیدا مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، ئەوئۆتۆنۆمییە عەقڵی رێنیشاندەر و بەبڕوا بوون بە خەڵك بۆی داناوە، نەك بەزەبری دۆخی نائاسایی، کە پێیدا تێپەڕیووە"[٢٣].

لەگەڵ ئەوەشدا حیزبی بەعسی دەسەڵاتدار، چەند مەبەستێکی هەبوو، لەوانە: (حکومەتی بەعس زۆر دڵنیابوو لەوەی کە داواکانی بارزانی بۆ ئۆتۆنۆمی هیچ شتێك نییە جگە لە ئاگربەستێکی کاتی نەبێت بۆکات بردنەسەر، تا دەست والا بێت بۆ پاکسازی بەرهەڵستکاران لەنێوخۆدا... ئۆتۆنۆمی لەجیاتی و لەبریی بۆ جیابوونەوەیە، چونکە ئەگەر ئۆتۆنۆمی بەکوردان بدات، ئەوا رێگەی بیرکردنەوەی جیابوونەوەیان لێدەگرێت....زۆرێك لایەن داوایان دەکرد کە ئۆتۆنۆمی بەکورد بدرێت، وەك (حیزبی شیوعیی عێراق، باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی) ئەم لایەنانە توانیان جەماوەر بجووڵێنن تا داوای ماف نەتەوەیی بکەن لەگەڵ ماف سیاسی و رۆشنبیری[٢٤]..... رژێمی بەعس ویستوویەتی لەرێی رێککەوتنێکەوە پلان بۆ لەنێوبردنی مستەفا بارزانی دابنێت یان گۆشەگیرو بێدەسەڵاتی بکات و لە هێزی چەکدارو دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەلایەتی دایبڕێت[٢٥].... حیزبی بەعس ماوەیەکی کورت بوو دەسەڵاتیان وەرگرتبوو، دەیانویست لە رێی بانگەشەکردن بۆ چارەسەری کێشەی کورد، رێزو نێوبانگ و پشتگیریی نێودەوڵەتی بۆ رژێمەکەیان بەدەستبهێنن[٢٦].

پێنجەم: کێشەی (عێـراق – ئێـران): کێشەوگرفتەکانی سنووری عێراق و ئێران، کە لە چوارچێوەی پەیمانی (سەعد ئاباد-١٩٣٧)داسنووری دیاریکراو بەوەرووبای شەتولعەرەب بەتێپەراندنی هێڵی سنووری ئێران بەرۆژهەڵاتیداڕێرەوی گرنگی ئاوی بە تەواوی کەوتە سنووری عێراقەوە. دواتر شای ئێران چەندین جار هەوڵی گۆڕانکاری پەیمانەکەی دا، بەو نیازەی سنووری (هێڵی تالووك)کە بەقووڵترین خاڵی رووبارەکەدا تێپەڕێنێت ودەسەڵات وسەروەریی خۆی بەسەرنیوەی ئاوەکەدا بسەپێنێت. لەگەڵ گەشەکردنی رەوتی نەتەوایەتیی عەرەب لە عێراق و مەترسیی شا لەکشانی ئەو رەوتە نەتەوایەتییە بەرەو ناوچەی عەرەبستانی زۆرینە عەرەب لە ئێران، بەردەوام هەوڵەکانی بۆ گۆڕانکاری لەپەیمانی سەعدا ئاباد دا رووبەرووی شکست دەبۆوە[٢٧]. تا ئەوهەلەی بۆ هەڵکەوت لە نیسانی ١٩٦٩ دا (محەمەد رەزا شای ئێران) یەك لایەنانە ئەو پەیمانەی پەیوەست بەشەتولعەرەبی هەڵوەشاندەوە[٢٨]، سەرەنجام پێوەندیی نێوان عێراق وئێران بەیەکجاری پچڕا[٢٩]. هاوکات ئێران کێشەی کوردی قۆستەوە ودەستیکرد بەوروژاندنی ناکۆکیی نێوان کوردەکان لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا وبەهەموو توانایەکی مادی و سەربازیەوە پشتیوانیی کوردی دژی عێراق دەکرد وئەوەش ترسی لای حکومەتی عێراق پتر کرد[٣٠]. بەوجۆرە مەترسی و نیگەرانییەکانی رژێمی بەعسی دەسەلاتدار لە پێوەندیی شۆڕشگێرانەی کوردی باشوور و ئێران، وایکرد تەنیا پەیمانامەی ١١ ئازاری رابگەیەنێت، بەئومێدی ئەوەی کارتی کوردی لە دەستی شای ئێران دەربهێنێت وبەسوودی خۆی بەکاربهێنێت.

شەشەم: رۆڵی یەکێتی سۆڤێت: هاندەرێکی گەورەی دانووستان و رێککەوتن بوو، ئەوەی کەوتنە نێوان عێراق و کوردەوە یەکێتی سۆڤێت بوو. سۆڤێت، کە لە ساڵی ١٩٥٨ەوە پێوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ عێراقدا هەبوو، نەیدەتوانی بەردەوام چەك بۆ عێراق بنێرێت و کۆمەکی ئابووری مسۆگەر بکات و کوردیشی لێ نەرەنجێت و دوژمنایەتیی پێ نەبرێت. جگە لەوە سۆڤێت دەیزانی ئەو شەرە بەردەوامەی کوردستان رەنگە لێکدانی عێراق وئێرانی بەدەمەوە بێت، کە ئەمە شتێك بوو دوور لەبەرژەوەندیی ئەو، چونکە رووداوێکی وا بەهەموو پێوەرێك دەستتێکەلکردنی ولاتەکانی سەنتۆ و ناتۆ (واتە ئەمریکا)ی لێ شێن دەبوو[٣١]. لایەنی سۆڤێتیش، وەك لایەنی سێیەم بەشێوەیەکی نافەرمی نێوانگیریی لەدانووستانەکان و پەیماننامەی ١١ ی ئازاردا کرد، کەئەو نێوانگرییەکاریگەریی زۆری لەسەر رازی بوونی بارزانی هەبوو تا بچێتە وتووێژەوە لەگەڵ حیزبی بەعسی سۆسیالیستدا. نێوانگریی سۆڤێت رۆڵێکی دیاری لە نزیکردنەوەی بۆچوونەجیاوازەکان لە دانووستانەکاندا هەبوو لە روانگەی رەهەندی نێودەوڵەتییەوە[٣٢]. بۆیە رۆڵی یەکێتی سۆڤێت بەهۆکارە هەرە کاریگەرەکانی دانووستان و رێککەوتنی کوردو حکومەتی عێراق هەژمار دەکرێت، لە پێناوی بەهێزکردنی پێگەی خۆی لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا.

کاری دانووستانی نێوان حکومەتی بەعسی و سەرکردایەتیی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد: دوای ئەوەی رژێمی بەعس بۆجارێکی تریش هێزی خۆی دژی بزاڤی کورد تاقیکردەوە و زنجیرەیەك هێرشی کردە سەر ناوچەکانی باشووری کوردستان بە گشتی و کەرکوك بەتایبەتی، لەوە گەیشت کە بەهێز و شەر ناتوانێت پرسی کورد یەکلایی بکاتەوە، بۆیە بڕیاریدا پەنا بباتە بەر دانووستان و کات کوشتن لەگەڵ باڵی مەلایی پارتی بە سەرکردایەتیی (مستەفا بارزانی). دانووستاندنەکان لەنێوان ساڵانی (١٩٦٩- ١٩٧٠) دا بەدوو قۆناغدا تێپەری، بەم جۆرە:-

قۆناغی یەکەم بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ لە مانگی حوزەیرانەوە دەستپێکردو مانگەکانی ئاب و ئەیلوول و تشرینی یەکەم و دووەمـی ساڵی ١٩٦٩ی خایاند[٣٣]، کە رژێمی بەعس بەچەند شێوازێکی جیاجیا، نیازپاکی خۆی بۆ دەستپێکردنی لـەگـەڵ بزاڤی رزگـاریخـوازیـی کـورد دا نیشاندا..کاتێك بەیاننامەی ژمارە(٢٧) لەلایەن (ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش)لەرادیۆ و تەلەفزیۆن خوێندرایەوە، (ئـەحـمـەد حـەسـەن بـەکـر) رایـگـەیـانـد ئـەنجوومـەنـی سەرکردایـەتـیـی شـۆڕش پـەیـمـان دەدات کە دۆزی کورد بەشێوەیەکی ئازادانە ودادوەرانە چارەسەربکات بەشێوەیەك خواستە نەتەوەییەکانی گەلی کورد دەستەبەربکات[٣٤].

ئەمە لە كۆنگرەی هەرێمی حەوتەمی (حیزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیستی) یشدا كە لە كۆتایی ساڵی ١٩٦٨ و سەرەتای ساڵی ١٩٦٩بەسترا، بانگەوازیان بۆكورد بریتی بوو لە ڕاگەیاندنی پەیوەستبوون بەبڕیاری مافی كورد لەپێدانی مافەكانیان و پێشخستنی تایبەتمەندییە نەتەوەییەكانیان لە چوارچێوەی یەكێتی گەل و نیشتمان و پێشڕەوی دەستووریدا[٣٥].

لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٩ دا(میشێل عەفلەق) ڕایگەیاند بوو، كە (حیزب لە دانی مافی ئۆتۆنۆمی بە كورد، ناڕازی نییە)و حكومەتی بەعس ڕایگەیاند یاسایەك لەسەر بنەمای (لامەركەزی) دادەنێت و پارێزگای دهۆكیش دروست دەكرێت[٣٦]. لە مانگی ئەیلوولی هەر لەو ساڵەدا بەعسییەكان لە ڕێگەی ڕێكخراوی (یەكێتی قوتابیانی كوردستان)[٣٧]ەوە چەند پێشنیارێكیان سەبارەت بە چارەسەركردنی دۆزی كورد، بۆ سەركردایەتیی شۆڕشی كوردستان نارد، گرنگترین خاڵێك كە ئاماژەی پێدرابوو ئامادەبوونیان بوو بەپابەندبوون بەبەیاننامەی (٢٩)ی حوزەیرانی ١٩٦٦)ەوە، بەڵام سەركردایەتیی شۆڕشی كوردستان دوای كۆبوونەوەیان، ئەو پێشنیارانەی ڕەتكردەوە، چونكە لەو پێشنیارەدا باس لە دەستپێكردنەوەی وتووێژنەكرابوو و پێشیان وابوو بەیاننامەی حوزەیران بۆ سەردەمی ئێستا گونجاو نییە و سەردەمەكە گۆڕانی بەسەرداهاتووە[٣٨].

لە(١٠ی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٦٩)دا (ئەنجوومەنی سەركردایەتی شۆڕش)ی عێراق لە بڵاوكراوەیەكیدا هەندێك لە مافە ڕۆشنبیرییەكانی گەلی كوردی سەلماند[٣٩]، وەك (زمانی كوردی لە هەموو قوتابخانە ئامادەییەكان و قوتابخانە پەروەردەییەكان و لە هەموو ئەكادیمیای سوپایی و پۆلیسییەكاندا دەبێت بخوێندرێت، لێكدانەوە و ڕاڤەكردنی وانەكان لە قوتابخانە كوردییەكاندا بەزمانی كوردی دەبێت و زمانی عەرەبی دەبێتە زمانی دووهەم... كتێبە زانستی و ئەدەبی و سیاسییەكان كە لەبارەی كوردو بەزمانی كوردی نووسراون دەخرێنە كتێبخانە گشتییەكان و كتێبخانەی قوتابخانەكانەوە..ڕێگە بە نوسەران و شاعیرانی كورد دەدرێت كە یەكێتییەكی سەربەخۆیان دابمەزرێنن... بەڕێوەبەرێتییەكی گشتی بۆ ڕۆشنبیری دابمەزرێنن.. ڕۆژنامەو گۆڤار بە زمانی كوردی بڵاوبكرێتەوە..بەرنامەی كوردی لە تەلەفزیۆنی كەركوكدا زیاد دەكرێت تا دانانی تەلەفزیۆنێكی كوردی و....تاد..)[٤٠]. بۆ جەختكردن لەو ئایدۆلۆژیایە و شوێنكەوتنی سیاسیەتێكی نوێ لەبارەی دۆزی كوردەوە، ڕۆژنامەی (الثورة) ی زمانحاڵی حیزبی بەعس ووتارێكی لە ژمارە(٤٠٤)ی (٢٢ی كانونی یەكەمی ساڵی ١٩٦٩) دا، بە نێونیشانی (چۆن ڕێگە بگرینە بەر بۆ چارەسەری كێشەی كوردی) بڵاوكردەوە كە تێیدا هاتبوو:" گەلی كورد گەلێكی دابەشكراوەو بە هاوسێیەتی چەند گەلێك، كە بریتین لە (عەرەب و فارس و تورك) دەژی، كە لەو گۆشەنیگایەوە بەدەست كێشەی دابەشبوونەوە دەناڵێنێت، ئەمەش كێشەیەكی زۆر مەترسیدارە"، دواتر (الثورة) لە كۆتایی وتارەكەیدا نووسیبووی:" حیزبی بەعسی عەرەبیی سۆسیالیستی ئەو حیزبەیە كە زۆرترین تێگەیشتنی بۆ كێشەی كوردهەیە، هەر ئەویش زۆر بەتوانایە بۆ چارەسەركردنی"[٤١]. بەشیكاركردنی ئەو وتارە (الثورة) دەردەكەوێت كە حیزبی بەعسی دەسەڵاتدار لەو كاتەدا ئارەزووی كردووە كە لە ڕێگەی دانووستانەوە كێشەی كورد چارەسەربكات، ئەگەر وەك سیاسیەتێكی تەكتیكیش بووبێت،....بەڵام مستەفا بارزانی نەیدەویست دۆستایەتیی ئێران لە دەست بدات، بۆیە لە سەرەتاوە دژی دەستپێشخەرییەكانی وتووێژ وەستایەوە، بەڵام پاش فشاری نوێنەری سۆڤێت بۆ دانووستان ڕازی بوو وئێرانیشی لەوە دڵنیاكردەوە، كە هەرگیز پشتیوانی ئەوان لەبیرناكات و پێوەندیشیان لەگەڵدا نابڕێت[٤٢]. لە ٢٤ی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٦٩دا، ڕژێمی بەعسی عێراق لەڕێگەی (عەزیز شەریف)[٤٣] ەوە بەنهێنی پەیوەندییان بە سەركردایەتیی شۆڕشی كوردستانەوە كرد، بۆ ئەوەی بۆ دەستپێكردنەوەی گفتوگۆ بیرو ڕایان بزانن. سەرنجامیش مستەفا بارزانی لەگەڵ مەكتەبی سیاسی و مەكتەبی تەنفیزیی پارتەكەیدا كۆبووەو، لەو كۆبوونەوەیەشدا لەسەر دەستپێكردنەوە وگفتوگۆ ڕەزامەندییان دەربڕی[٤٤]. لەو كاتەدا بەعسییەكان پێش ئەوەی نوێنەری خۆیان بۆلای مستەفا بارزانی بنێرن، شاندێكیان بۆ پرس و ڕاوەرگرتنی ژمارەیەكی زۆر ڕۆشنبیر و كەسایەتییە دیارەكانی كورد سەبارەت بەچارەسەری دۆزی كورد نارده باشووری كوردستان، سەردانی بەشێك لەشارو شارۆچكەی كوردستانیان كردو بۆیان دەركەوت گفتوگۆكردن لەگەڵ سەركردایەتیی بزاڤی كوردستان بۆ چارەسەری كێشەی كوردگرنگە[٤٥]. لێرەدا حكومەتی بەعس ویستوویەتی پێگەی جەماوەریی مستەفا بارزانی بزانێت، ئەو كات گفتوگۆی لەگەڵدا بكات.

پاش وەڵامدانەوەی ئەرێنی پارتی دیموكراتی كوردستان، پارتی بەعس بڕیاریدا بچێتە دانووستانێكی نهێنییەوە[٤٦]. بەوجۆرە پێوەندی نێوان ڕژێمی بەعس و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی كوردستان (باڵی مەلایی) پێی نایە قۆناغێكی نوێ و قۆناغی دووەمی گفتوگۆی نێوانیان، كە قۆناغی ڕاستەوخۆی دانووستان، كە لە كانوونی یەكەمی ١٩٦٩ تا ئازاری ساڵی ١٩٧٠ی خایاند. لە١٨ ی كانوونی یەكەمی ساڵی ١٩٦٩ دا (سەمیر عەزیز ئەلنەجم)، كە ئەندامی سەركردایەتیی شۆڕشی عێراق بوو، لەگەڵ دوو كەسایەتیی دیار لەسەر ئاستی عێراق و كوردستان كە (عەزیز شەریف و فوئاد عارف) بوون، چوونە ناوپردان بۆ لای مستەفا بارزانی[٤٧]. ڕۆژێك لە كوردستان مانەوە و ئامادەیی حكومەتیان بۆ وتووێژكردن و ڕێككەوتن، نیشاندا[٤٨]. پاش گفتوگۆیەكی یەكرۆژی (مستەفا بارزانی) دارا تۆفیقی[٤٩] لەگەڵ شاندەكەی حكومەت نارد بۆ بەغداد[٥٠]، لە بەغداد(دارا تۆفیق)یش خواستی چارەسەركردنی دۆزی كوردی لەسەر بنەمای ناناوەندییكارگێڕیی(الإدارە اللامركزیە) بۆ بەرپرسانی باڵای حكومەتی بەعسی عێراق خستە ڕوو[٥١]. دەسەڵاتدارانی بەعس لەنێوخۆیاندا بوون بەدوو بەشەوە و بەشێكیان لەگەڵ ڕانەگرتنی شەڕبوون، ئەم لایەنە پێیان

ولبوو داواله پارتی (باڵی مەکتەبی سیاسی - باسکی جەلالی) بکرێت بۆ پێشکەشکردنی پرۆژەیەك ئەگەر ئەقڵ گرتی ئەو پرۆژەیە جێبەجێ بکرێت. کاتێك کە پرۆژەی نەوان پێشکەشکرا، بریتیبوولە پرۆژەی ئۆتۆنۆمی بۆ هەموو ناوچە کوردنشینەکانی باشووری کوردستان بە کەرکوك و هەموو قەزاکانی سەربە مووسڵ و ناوچە کوردییەکانی سەر بەدیالە، بەپێشکەشکردنی پرۆژەی باڵی مەکتەبی سیاسیی نەرکەوت کە داوای ئەوان گەلێك پتر ترە لەوەی باسکی مەلایی داوای دەکات، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی باڵی مەدەنی بەعس هەڵوێستی بەهێز تربێت بۆ وتووێژ لەگەڵ مستەفا بارزانی[٥٢]. بەڵام (سەددام حوسێن) لە بەرانبەر داواکەی (دارا تۆفیق)دا بە ناوەندیی بە ناسەنتەری کارگێڕیی، پرسیی(چ شتێکە واتان لێدەکات داوای ئۆتۆنۆمی نەکەن؟)، دارا لە وەڵامدا گوتبووی:"ئێوە ئامادەن بۆ بیستنی ئەم وشەیە بێ ئەوەی گرژبن"[٥٣]. هۆی داوانەکردنی ئۆتۆنۆمیش لەلایەن سەرکرایەتی شۆڕشی رزگاریخوازی کوردستان، وەك داواکارییەکی سیاسی لە سەرەتای دانووستان، لەبەر ئەوە بوو کە بروا نەدەکرا حیزبی بەعسی دەسەڵاتدار بەوداواکارییە رازی ببێت[٥٤]. کەدواتر بووە داواکاریی سەرەکی کورد.

دارا تۆفیق چووە بەیروت و سەردانی (میشیل عەفلەقی) ی سکرتێری گشتی حیزبی بەعسی کرد[٥٥]، داوا وئامادەیی کوردی بۆ دانووستان پێگەیاند، دارا دوای چەند رۆژێك مانەوە لە بەغداد و بەیروت، گەرایەوە کوردستان ورایگەیاند دەسەڵاتدارانی حکومەتی بەعس دەیانەوێت وتووێژ بکەن و ئۆتۆنۆمییان پێ پەسەندە[٥٦].

لە٣١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٩ دا شاندێکی گەورەی حیزب و حکومەتی بەعسی عێراق، بە سەرۆکایەتیی (حەممەد شەهاب)ی سەرۆکی ئەرکانی سوپای عێراق و ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشیی عیراق، بە ئەندامێتی هەریەك لە (عەبدولخالق سامەرائی، مورتەزا ئەلحەدیسی، سەمیر عەزیز ئەلنەجم) کە ئەندامی سەرکردایەتیی هەرێمایەتیی بەعس و ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشی عێراق بوون و لەگەڵ (محەمەد عەلی سەعید) و بەهاوکاری (عەزیز شەریف و فوئاد عارف) کە دووکەسی بێلایەنن لەسەر داوای فەرمانرەوایانی عێراق یاوەری شاندەکە بوون بۆ دانووستاندن، سەردانی سەرکرادیەتی شۆڕشی کوردستانیان کردو لەگەڵ سکرتێری پارتی (حەبیب محەمەد کەریم) و(محەمەد مەحموودعەبدولرەحمان - سامی، ئیدریس بارزانی، دکتۆر مەحموود عوسمان، ساڵح یوسفی، نوری شاوەیس، عەلی عەبدوڵلا ودارا تۆفیق) دا کۆبوونەوەو گفتوگۆیان دەستپێکرد و شاندی عێراق نامەی[٥٧] سەرۆککۆماریان گەیاندە (مستەفا بارزانی) وئەویش لە رێگەی شاندەکەوە وەڵامی نامەکەی سەرۆك کۆماری دایەوە[٥٨].

لە٧ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٠ دا شاندێکی پارتی کە پێکهاتبوو لە (دکتۆر مەحموود عوسمان، - سەرۆکی شاند، ئیدریس بارزانی، مەسعوودبارزانی، سامی عەبدولرەحمان، دارا تۆفیق، موحسین دەزیی، نافیزجەلال و ساڵح یوسفی) بۆ دانووستاندن لەگەڵ رژێمی بەعس چوونە بەغداد، گفتوگۆکان درێژەیان کێشا[٥٩]، لەبەر ئەوەی بیرو رای جیاواز لای هەردوولا لەسەر هەندێك پرسی چارەنووساز هەبوو، بەتایبەتی دیاریکردنی سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی[٦٠] و شاری کەرکوك، شاندی کوردو عەرەب لەسەر شاری کەرکوك ناکۆکبوون و عەرەبەکان رازینەبوون کەرکوك بەشێك بێت لەناوچەکانی کوردستان، لەبەرامبەریشدا کوردەکانیش بەوە رازی نەبوون بەشێك بێت لە ناوچەی نێوەندو لە کوردستان جیابکرێتەوە[٦١]. لەکاتیی دانووستانەکاندا نوێنەرانی بەعس بەنوێنەرانی کوردیان وت:" دەبێت مەلا مستەفا کەرکوك و هەر ناوچەیەکی تری پترۆل لەبیر خۆی بباتەوەو دانووستانی لەسەر ناکرێت"[٦٢]. نوێنەرانی شاندی کوردیش بەحکومەتی بەعسی عێراقیان راگەیاند بەهیچ شێوەیەك دەست لە کەرکوك وشەنگار و خانەقین هەڵناگرین و ئەمە لەتوانادا نییە پەسەندی بکەین، شاندی کورد لەبەغداد گەرانەوە و چوونە لای مستەفا بارزانی و بیروڕای حکومەتی بەعسی عێراقیان پێگەیاند[٦٣]. مستەفا بارزانیش لەسەر ئەوە پێداگرییکرد کەرکوك و ناوچەنەوتییەکانی باکووری عێراق، دەبێت لە سنووری هەرێمی ئۆتۆنۆمی کوردیدابن[٦٤]. (شاری کەرکوك) یش بکرێتە نێوەندی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستان[٦٥]. بەوجۆرە لەسەر پرسی کەرکوك دانووستانەکان بۆ ماوەیەك وەستا[٦٦]، وەك زۆربەی دانووستاندنەکانی تر سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردستان و حکومەتەکانی عێراق کە لەسەر زۆربەی خاڵەکان رێکەدەکەوتن، بەڵام کە دەگەیشتە کێشەی سنووری ناوچەکە و پرسی کەرکوك ئیدی دانووستان بەرەو لێکترازان ورێکنەکەوتن دەرۆیشت، کەواتە کێشەی کەرکوك لەوەستان و رێکنەکەوتنی دانووستانەکانی کوردو عێراقدا خاڵی جەوهەری بووە.

بۆ چارەسەری گرفتەکان (سەددام حوسێن) لە ١٠ ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٠ دا، چووە لای مستەفا بارزانی و سەبارەت بە ناوچەی ئۆتۆنۆمی لەگەڵیدا کەوتە ووتووێژ، سەددام بە مستەفا بارزانی وت:" کەناوچەی ئۆتۆنۆمی پارێزگاکانی (سلێمانی و هەولێر و دهۆك) دەگرێتەوە، بەڵام کەرکوك و ناوچە کوردنشینەکانی وەك (خانەقین و سنجار و دەوروبەری مووسڵ) لە گفتوگۆ و دانووستاندا قسەی لەسەر دەکرێت"[٦٧]. تەنانەت (سەددام) لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادەیی دەربریبوو لەسەر دابەشکردنی کەرکوك بەپێی رووبای (خاسە) کە بەنێوەراستی کەرکوکدا تێدەپەرێت، بەڵام مستەفا بارزانی ئەو پێشنیارەی رەتکردەوە و داوایکرد سەبارەت بە کەرکوك کار بەسەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ بکرێ[٦٨].

لە ٢٨ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٠ دا شاندێکی تری عێراق بە سەرکردایەتیی (حەردان تکریتی)[٦٩] سەردانی کوردستانی کردو لەکاتی وتووێژەکاندا کێشە و ئاڵۆزی لەسەر کەرکوك دروستبووەوە لەو کاتەی (عەبدوڵلا سەلووم ئەلسامەرائی)[٧٠] بە مستەفا بارزانی گوتبوو:" کەرکوك کوردستانی نییە[٧١]و کێ دەتوانێت پێچەوانەی ئەمە بسەلمێنێت"، مستەفا بارزانی بەتوورەییەوە لە وەڵامدا پێیدەڵێت:" من دەڵێم کەرکوك کوردستانییە، ئاگاداربە

لەوەی کە بڵێن کوردستانی نییە، بەڵکو بڵی ئێمە داگیرمان کردووە، تەنانەت یەك کوردیش لە کەرکوکدا نەمێنێت شارێکی کوردییە، ئەوەش بزانە کە هەرگیز دەست لە کەرکوك هەڵناگرین"[٧٢]، ئەوەی ووتووە و هەڵساوەو وتویەتی:" لە کۆبوونەوەیەکدا دانانیشم کە کەسێکی ئەوتۆی تێیدا بێت"، بەڵام ئامادەبووان زۆر تکایان لێکرد، کەچی ئەو دانەنیشت تا سامەرائی لە کۆبوونەوەکە چووە دەرەوە، دوای ئەوە هەموویان سەبارەت بە کەرکوك بێدەنگ بوون[٧٣]. ئەمە ئەو راستییە دەردەخات کە سەرکردایەتیی بزووتنەوەی کورد، قەت سازشی لەسەر ئەوەی کەرکوك بەشارێکی کوردی هەژمار نەکرێت نەکردووە و بەرپەرچی هەموو ئەوانەی داوەتەوە کە ئەو جۆرە بۆچوونە شوفێنییانەیان سەبارەت بەو شارە هەبووە.

سەرەنجام واژۆکردن لەسەر رێککەوتنامە لەنێوان کوردو حکومەت دوواکەوت، بەهۆی هاتنەکارای ناکۆکی لەنێوان هەردوولا لەبارەی بابەتەکانی سنووری ناوچەی کوردستان و کەرکوك وداهاتووی پێشمەرگە[٧٤]، تەنانەت دانووستان بۆماوەی (٢٠)رۆژ وەستا[٧٥]. بەڵام کاتێك (سەددام حوسێن) لە٨ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠دا بەسەرۆکایەتیی شاندێکی باڵای میری گەیشتە کوردستان و لە رۆژی (٩ ی ئازار) داچاوی کەوت بە مستەفا بارزانی، جەختیکرد کە حکومەت ئامادەیە واژۆ لەسەر سەرجەم بابەتەکانی کە لە دانووستانەکانی پێشووتر لەبەغدادو ناوپردان بکات کەپێی گەیشتوون، لەشەوی (٩-١٠ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠)دا واژۆ لە سەر رێککەوتنامە یەك لەنێوان (مستەفا بارزانی و سەددام حوسێن)دا لە (ناوپردان)کرا[٧٦]. کە ئۆتۆنۆمی بە کورد بدرێت بۆ پارێزگاکانی (هەولێر و سلێمانی و دهۆك)، بەڵام کەرکوك و ناوچە کوردنشینەکانی تری، وەك (خانەقین و سنجار و دەوروبەری مووسڵ) بۆ دواتر بمێننەوە[٧٧]، لە ماوەی (٤) ساڵی جێبەجێکردنی رێککەوتنامەکەدا چارەسەربکرێن[٧٨]. لێرەدا دبلۆماسییەتی سیاسی بەعس توانی سەرکەوتن بەسەر دبلۆماسییەتی سیاسی سەرکردایەتیی کورد، لە هێشتنەوەی کێشەی کەرکوکدا لەکاتیی لاوازی خۆیدا بۆ ئەو ماوە دیاریکراوە وەدەستبێنێت.

پاش دوو رۆژ لە رێککەوتنی نێوان (سەددام حوسێن) و (مستەفا بارزانی) لە ئێوارەی رۆژی ١١ ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ دا رێککەوتنەکە بەفەرمی لە وێستگەو تەلەفزیۆنی بەغدادەوە بەدەنگی سەرۆککۆماری عێراق (ئەحمەد حەسەن بەکر) راگەیەندرا و دووابەدوای ئەوە (د. مەحموود عوسمان) برووسکەی پشتگیریی (مستەفا بارزانی)ی فەرماندەی شۆرشی چەکداریی کورد و سەرۆکی پارتیی خوێندنەوە[٧٩].

ئەو بەیاننامەیە لە (١٥)مادەی[٨٠] ئاشکراو (٧)مادەی نهێنی پێکهاتبوو، لە گرنگترین بەندەئاشکراکانی کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ و ناراستەوخۆ پێوەندییان بە کەرکوکەوە هەبوو، بەم شێوەیەبوون:-

- لە بەندی (١) دا هاتووە:" زمانی کوردی شانبەشانی زمانی عەرەبی زمانێکی فەرمی بێت، لەو ناوچانەدا کە زۆربەی دانیشتووانیان کوردن. لەم ناوچانەدا دەبێ کوردی، زمانی وانە وتنەوە بێت، لەهەموو ئەو ناوچانەدا کە قسەیان بە کوردی تێیدادەکرێ دەبێت وانەی زمانی عەرەبیش بووەترێتەوە، وەك چۆن وانەی کوردی لە ناوچەکانی تری عێراقدا دەوترێتەوە ". کەواتە بە گوێرەی ئەم مادەیەی بەیانی ١١ی ئازار بێت، دەبوایە خوێندن لە شاری کەرکوکدا بە فەرمی بە کوردی بووایە، چونکە لە زۆربەی سەرژمێرییە فەرمی و نافەرمییەکانی پێش ساڵی ١٩٧٠، کەرکوك زۆرینەی کورد بووە.

- لەبەندی (٤) داهاتووە: " کاربەدەستانی ئەو پارێزگاو قەزا وناحیەیانەی کە زۆربەی دانیشتووانیان کورد دەبێت کوردبن یان کوردی بزانن"، بەپێی ئەم مادەیەش دەبووایە کاربەدەستانی کەرکوك بەشێکیان کوردبن، ئەوانەی کوردیش نین، دەبووایە کوردی بزانن کەواتە ئەم بەندەی بەیانی ١١ ی ئازار بۆ بەکوردیکردنی دامودەزگاکانی کەرکوك، ئەگەر جێبەجێ بکرایە زۆر گرنگ بوو.

- لەبەندی (٦)لقی (ب) دا هاتووە:" کرێکار و کاربەدەست و مووچەخۆرە سوپایی ومولکییەکان دەگێرنەوە بۆ سەر ئیشی خۆیان بەبێ گوێدانە (میلاك) هەریەك بەپێی ئیشی خۆی لە ناوچەی کوردەواریدا دەخرێنەوە سەرئیشی خۆیان، بەپێی پێویستیی ئەو ناوچەیە"، ئەم بەندەی بەیانی (١١)ی ئازار پێوەندیەکی راستەوخۆی بە دانیشتووانی کەرکوکەوە یە، لەبەر ئەوەی کارمەندان و کرێکارانی کەرکوك پشکی شێریان لە سیاسەتی راگواستن و دەکردندا بەرکەوتبوو لەچاو ناوچەکانی دیکەی باشووری کوردستان.

- لەبەندی (٧) لقی (ا) دا هاتووە:" پێکهێنانی کۆمەڵێك لە پسپۆران بۆ راپەراندنی کارەکانی ناوچەی کوردەواری لە هەموو روویەکەوە، لە زووترین کاتدا، بژاردنەوەی ئەو زەرەروزیانانەی کەلەم ساڵانەدا لێی کەوتووە. تەرخانکردنی بوجەیەکی باش بۆ بەجێهێنانی ئەو مەبەستە". ئەم بەندەی (١١)ی ئازاریش بۆ زیانلێکەوتوانی دانیشتووانی کەرکوك و دەورووبەری زۆر گرنگ بوو، وەك(گەرەکی کۆماری، زۆر لەو گوندانەی سەر بەنێوەندی قەزای کەرکوك..تاد. ).

- لەبەندی (٨) دا هاتووە:" گێرانەوەی دانیشتووانی دێهاتە عەرەب و کوردەکان بۆ جێگەی پێشوویان، دانیشتووانی ئەو دێهاتانەش کە کەوتوونەتە شوێنی واوە کە بۆتیادانیشتن نابێت وحکومەت بەپێی یاسا بۆ بەرژەوەندی گشتی بردونی بۆخۆی، ئەوانە لە شوێنی نزیکی شوێنەکانی پێشوییان دادەمەزرێندرێن و هەرزیانێکیان بەبۆنەی ئەوەوە تووش بووبێت، بۆیان بژمێردرێتەوە". ئەم بەندەی (١١)ی ئازار راستەوخۆ پێوەندیی بە چارەسەری پرۆسەی بەعەرەبکردنەوە لەشاری کەرکوك هەبوو، کەلە ساڵی ١٩٣٦ ەوە حکومەتەکانی عێراق بەفەرمی لە کەرکوك ودەورووبەری جێبەجێیان دەکرد.

- لەبەندی (١٤)داهاتووە:" دوای جاردانی ئەم بابەتە چی پێویست بێت دەکرێت بەپرس و را بەیەککردن لەگەڵ لیژنەی بەرزی سەرپەرشتیکردنی جێبەجێکردنی بەیانەکەدا، بۆیەك خستنی ئەو پارێزگاو یەکە ئیدرایانەی کە زۆربەی دانیشتووانیان کوردن بەپێی ئەو سەرژمێرییەی

لەمەودوا دەکرێ. حکومەت لەمەودوا هەوڵئەدات بۆ پێشخشتنی ئەو پارچە یەکخراوانە، بۆ پەسەندکردن و فراوانکردن و سوود وەرگرتنی گەلی کورد لەو ناوچەیەدا لە مافە نەتەوەییەکانی بۆ ئەوەی ببێت بە مسۆگەرکەری بەهرەداربوونی لە حوکمی خۆبەخۆیی (ئۆتۆنۆمی -الحکم الذاتي)دا تا ئەو ڕۆژەی ئەم یەکێتییەی ناوچە کوردییەکان بەراستەدەگرێت، کاروباری نەتەوەی کورد لە ڕێگەی کۆبوونەوەی بەیناوبەینەوە لەنێوان لیژنەی هەرە بەرزو پارێزگارانی ناوچەی باکووراجێبەجێدەکرێت. لەبەرئەوەی کە حوکمی خۆبەخۆیی لەچوارچێوەی کۆماری عێراق دەبێت، ئاشکرایە سوود وەرگرتن لەسامان سروشت کردەکانی ئەو ناوچانە بەدەست حکومەتی کۆماری عێراقەوە دەبێت".[81] ئەم بەندە ڕاستەوخۆ پێوەندی بە کەرکوك و نێوەچەکانی دیکەوە کە مایەی پێکنەگەیشتن و لەسەر گوتن بوو لەلایەن کوردو ڕژێمەکانی عێراقەوە هەبوو.[82] بەڵام لەڕاستیدا بەندی (١٤)ی بەیاننامەکە دژی چارەسەری کێشەی کەرکوك و هۆکاری پتر قووڵکردنەوەی کێشەکە بوو، چونکە دیاریکردنی کاتیی زۆر بۆ چارەسەرکردن وکردنی سەرژمێر وەك پێوەربوو چارەسەرکارێکی ئاسان نەبوو لەبەر ئەوەی یەکەم: حکومەت ڕێگەی نەدەدا بە ئاسانی سەرژمێری بکرێت یان کێشەی لەبەردەم کردنیدا دروستدەکرد..دووەم: ئەگەر سەرژمێریش بکرایە حکومەتی نێوەند ڕێگربوو لەکردنی سەرژمێرییەکی پاك و گزیی لە بەرژەوەندیی خۆی تێدادەکرد..سێیەم: بوونی ئەوبەندە سەرەتایەکی نوێ و ترسناك بوو، بۆ هاندانی حکومەتی بەعس بۆ گۆڕانی دیمۆگرافیای دانیشتووانی کەرکوك و دەستکاریکردنی تۆماری سەرژمێریی ساڵی ١٩٥٧[83] کە بەباشترین تۆماری عێراق هەژمار دەکرا)، جا ئەوەی ئەو ڕاستیانەش پتر پشتڕاستدەکاتەوە، ئەم دوونموونەیەن:- نموونەی یەکەم:- لەکاتیی ئاهەنگ گێرانی بەیاننامەی ١١ئازاری دا، ڕۆژنامەنووسێکی میسری لە پارێزگاری کەرکوکی پرسی بوو (ئایا سەرژمێریی ئەنجامدەدەن؟)، پارێزگار لە وەڵامدا گوتبووی:" هەتا کاتیی ئەو سەرژمێرییە دێت، پێکهاتەی دیمۆگرافی کوردستان وکەرکوك دەگۆڕێت"،[84] نموونەی دووەم: پاش چەند ڕۆژێکی کەم لە بڵاوکردنەوەی بەیاننامەی ١١ ئازار، (سەددام حوسێن) لە ڕۆژنامەی (ئەلئەهرامی قاهیرە)دا وتبووی:"لە چوارچێوەی دانووستانەکانا کە بەئەنجام گەیەندرا، هەرگیز بەرەهایی هیچ جیاوازییەك لەبارەی چارەنووسی کەرکوکەوە نەبوو. کەواتە لێرەوە ئەو بارودۆخەی کەرکوك و کاریگەرییەی لە خۆبەخۆیی کوردی دا پێویست نییە ببێتە هۆی دروستبوونی مەترسی، ئەو سەرژمێرییە گشتیانەی کە لە عێراقدا ئەنجام دەدرێن، بریتییە لەوەی کە دەریدەخات، کە (ئایا کورد زۆرینەی دانیشتووانن یان نا؟)، ئەگەر کەرکوك لە چوارچێوەی ئەو ناوچانەدا بێت کە کوردەکان زۆرینەی دانیشتووان پێکدەهێنن، ئەوا لاریمان نییە کە بچێتە چوارچێوەی بازنەی ناوچەی کوردییەوە، واتە ئەوکات ئەویش حوکمی خۆبەخۆیی وەردەگرێت!!).[85] ئەو دوو وەڵامەی (سەددام حوسێن) و پارێزگاری کەرکوك، ئەوە ڕووندەکاتەوە، کە حکومەتی بەعس مەبەستی لە ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی ئازار تەنیا پلانێکی تاکتیکی بووەو، کە ویستوویەتی سوود لەو کاتە وەربگرێت بۆ پتر بەئەنجام گەیاندنی پرۆسەی بەعەرەبکردن و ڕاگواستنی کورد بەگشتی و کەرکوك بەتایبەتی.

دواتریش دەرکەوت، کە بەیاننامەی ١١ ی ئازار پاشکۆیەکی (٧) بەندیی لەگەڵدابوو، کە پێکهاتبوون لە(یەکەمیان لەبارەی مۆڵەتدان بوو بەپارتی دیموکراتی کوردستان، کە بەفەرمی کاری ڕێکخراوییی خۆی بکات. دووەمیان بابەتی چارەسەرکردنی کێشەی جاش بوو. سێیەمیان لەبارەی کۆکردنەوەو کشانەوەی سەربازیی بوو لە کوردستان. چوارەمیان پەیوەست بەدروستکردنی (دوازدە) بەتالیۆن (فەوج)بوو لە پێشمەرگە وەك پاسەوانی سنوور. پێنجەمیان تایبەت بوو بەهاوکاری ماددی بۆهێزی کوردی. شەشەمیان لەبارەی چەکداماڵینی کورددان بوو. حەوتەمیان پەیوەست بوو بە کێشەی سنوور و شاری کەرکوك).[86] بەپێی بەندی (٧)ی نهێنییەکە، دەبوو سەرژمێریی گشتی هەمەلایەنە لە عێراق لەماوەی یەك ساڵ دوای واژۆکردنی پەیماننامەی ئازار واژۆبکرێت، بۆ دەستنیشانکردنی ئەو ناوچانەی کە زۆرینەی دانیشتووانەکەی کوردن بەپشتبەستن بەسەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ کەبۆ ئەوە ببێتە بنەمایەك.[87] بەپێی ئەوبەندەبێت دەبوو لە ماوەی یەك ساڵدا دوای واژۆکردنی بەیانی ١١ی ئازار، کێشەی کەرکوك و ناوچە کێشە لەسەرەکان، کە خاڵی هەرە جیاوازی سەرکردایەتیی شۆڕش و حکومەتەکانی عێراق بوو، چارەسەربکرایە، بەڵام لەڕاستییەکەی دەسەڵات زۆر لە نیازو مەرامەکانی خۆی لەبارەی چارەسەرکردنی ئەو ناوچانە دەشاردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا مستەفا بارزانی و سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد پاش نۆ ساڵ لەشەڕی بێوچان وماندووبون، کەوتبوونە ژێر کاریگەریی ئەو پڕوپاگەندانەوە، کە حکومەتی عێراق لەبارەی ئەو پەیماننامەیە دەیکرد و بەهۆیەوە ستایشی خۆی دەکرد[88].

پەیماننامەی (١١)ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ لەهەردوو لایەنی کورد و عەرەبەوە لەنێوجەماوەردا پێشوازییەکی گەورەی لێکرا[89]. لە١٢ی ئازاردا بۆخۆشحاڵی دەربڕین خۆنیشاندانێکی جەماوەریی گەلانی عێراق لە بەغدادی پایتەخت بەڕێوەچوو، کە سەرکردایەتیی بەعس و گەورە بەرپرسانی حکومەت و شاندی گەورەی کورد تیایدا ئامادەبوون و لەبەردەم جەماوەرێکی بەرفرواندا سەرۆککۆمار (ئەحمەد حەسەن بەکر) وتارێکی خوێندەوە و (د. مەحموود عوسمان)یش پەیامی کورد و مستەفا بارزانی خوێندەوە[90]. دواتریش لەسەر داوای سەرۆك کۆمار شاندی هاوبەشی کوردو ڕژێمی بەغداد سەردانی شارەکانی تری عێراقیان کرد[91]. ئەوکات دانیشتووانی کەرکوکیش وەك دانیشتووانی سەرجەم شارەکانی تری عێراق بەدەرچوونی ئەو پەیماننامەیە زۆرخۆشحاڵ بوون و لە زۆر شوێنی شاردا ئاهەنگیان گێرا، بەتایبەتی لە گوندی حەسار[92]، پێشمەرگە لەوێ گۆڕەپانێکی گەورەیان دروستکرد و

بانگەشەیان بۆ دانیشتووانی كەركوك ودەوروبەری كرد بەمەبەستی ئاهەنگێڕان، ئاهەنگێكی گەورە بەڕێوەچوو[93]. (مامۆستا وریا حەسەن) وەك گەواهیدەرێكی كەركوك كاتیی دەرچوونی بەیانی (١١)ی ئازار و رەنگدانەوەی[94] لەسەر كەركوك دەڵێت:" بەدەرچوونی بەیانی (١١)ی ئازاری ١٩٧٠ دانیشتووانی كوردی كەركوك زۆر خۆشحاڵ بوون و ئاهەنگیان دەگێڕا، بەڵام توركمانەكان پێیان ناخۆش بوو لەبەر ئەوەی ماف بەنەتەوەی كورد درابوو ".[95] لێرەدا ئەو راستییە بەرجەستە دەبێت، كە بەشێك لە توركمانەكانی كەركوك دژ بەهاتنە دی مافەكانی كورد لە كەركوك دابوون، كە هەر كاتێك باس لە جۆرێك لە ماف كورد كرابێت، ئەوان دژی بوونەتەوە.

بەیانی (١١)ی ئازار سەرەتا تین وتەوژمێكی زۆری دا بە بزووتنەوەی كورد لە سەرانسەری كوردستاندا، كاربەدەستانی عێراق لەبەیانی ئازاردا ماف نەتەوەیی كوردیان لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی سەلماند. پارتی دیموكراتی كوردستان لە عێراقدا گرنگییەكی گەورەی پەیدا كردو بەئاشكرا كەوتە چالاكی، رۆژنانەی (ئەلتەئاخی) جارێكی تر دەرچووەوە[96] و لە كەركوكیش گۆڤاری (گزنگی كەركوك ١٩٧٢، گۆڤاری باباگوڕگوڕ ١٩٧٣) لەلایەن یەكێتی قوتابیانی كوردستان(لقی كەركوك)دەركرا،[97] بواری (ئەدەبی و هونەری و كلتووری) یش لە كەركوكدا پیشكەوتنێكی بەرچاوی بەخۆوە بینی.[98] (لەتیف هەڵمەت)یش وەك گەواهیدرێكی ئەوكاتیی كەركوك، دەڵێت:" لەسەرەتای حەفتاكاندا بەهەر لایەكدا بڕۆیشتیتایە ماڵە كورد و رانگوچۆغە لەبەرو گۆرانی كوردی بوو، من دەتوانم بڵێم:" ئەوبەری شۆڕیجە لەدوای بانگی عەسر، حكومەتی عێراقی نەیدەتوانی بپەڕێتەوە ئەو بەری پردەكەو، سنووریان بۆحكومەتی فاشی بەعس دانابوو".[99] (پێنج) كورد خرانە وەزارەتەوەو چەند كوردێكی تر كرانە جێگیری وەزارەت، چەندین فەرمانبەری گەورە لە ئەندامانی پارتی دانران، لەوانە سێ پارێزگای (سلێمانی و هەولێرو دهۆك)، هەروەها(شەش) فەوجی (حەرەس حدود) پاسەوانی سنوور لە پێشمەرگە پێكهێنران، چەندین خوێندكاری كورد لە كۆلێژەكانی سەربازیی و پۆلیس وەرگیران، چەند كەسێك بەباڵوێزدانران.[100]

بەو جۆرە سەرەتاكانی دوای بڵاوكردنەوەی پەیماننامەی (١١)ی ئازار بۆ كورد بەگشتی وكوردی كەركوك بەتایبەتی بەبەراوورد لەگەڵ ساڵەكانی پێشوو، بەماوەیەكی زێرین دادەنرێت. لەو ماوەیەدا تارادەیەك ئاشتی باڵی بەسەرباشووری كوردستاندا كێشابوو، زەبرو زەنگی حكومەت تارادەیەك نەمابوو، باری ئابووری و خوێندن و رۆشنبیری[101] و ئەدەبی بوژانەوەیەكی باشیان بەخۆوەبینی. بەڵام لە راستییەكەی ئەو بەیاننامەیە زۆر لە كێشە بنەرەتییەكانی نێوان كوردو حكومەتی نێوندی یەكلانەكردبۆوە. هاوكات سروشتی سیاسیی حكومەتی بەعس نەگۆڕرابوو. پێوەندیی نێوان كورد و حكومەتی بەعس دوای دەرچوونی بەیانی ١١ ئازار بەشێوەیەكی هێمنانەو لە یەككەیشتن نەدەرۆیشت، بەڵكو پتر لە شێوەی ململانێی سیاسی و پێكدادانی تایبەتیدا خۆی دەنواند، بەهۆی (هەوڵی تیرۆركردنی مستەفا بارزانی و ئیدریس بارزانی، رازی نەبوونی حكومەتی بەعس، كە(حەبیب محەمەد كەریم) ببێتە جێگری سەرۆككۆماری عێراق، هیچ كوردێك نەكرایە نێو ئەنجوومەنی سەركردایەتیی شۆڕشی عێراق، لە دەستووری كاتی ساڵی ١٩٧٠دا و بە گوێرەی پەیماننامەی (١١)ی ئازار، ناوی كورد نەبراو نەتەوەی عێراق وەك بەشێك لە نەتەوەی عەرەب دانراو، نەدانی دەسەڵاتی راستەقینە بەشالیارانی كورد لە بەغداد و دەركردنی كوردی فەیلی..تاد... ).[102] لەلایەكی تریشەو جێبەجێنەكردنی ئەوبەندانەی كە پێوەندیی راستەوخۆ و ناراستەوخۆیان بە كەركوكەوە بوو، پتر كێشەكانی نێوان كوردو حكومەتی بەعسی ئاڵۆزتر دەكرد، لەوانەش:-

یەكەم: هەڵوەشاندنەوە و بە عەرەبكردنی خوێندنی كوردی لە پارێزگای كەركوك، دوای ئەوەی كە كورد بە زمانی نەتەوەیی خۆیان دەیانخوێند و لە بەندی (١) پەیماننامەی (١١)ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠دا ئەمە بۆ كورد دەستەبەركرابوو، هەروەها دەستیكرد بە گۆڕینی ناوی خوێندنگە كوردییەكان بۆ ناوی عەرەبی.[103] لەلایەكی تریشەوە بەپێی بەندی (٤) یش كە دەبوو كاربەدەستانی پارێزگا و قەزا و ناحییەكانی زۆرینە كورد، كوردبن یان كوردی بزانن. بۆ ئەوەش حكومەتی نێوەند هیچ هەنگاوێكی بەكردار نەنا و بەردەوامیش بووە هێنان و دانانی كاربەدەستانی عەرەب لەشاری كەركوك و دەوروبەریدا.[104]

دووەم: هەرچەندە بەپێی بەندی (٦)ی پەیماننامەی (١١) ی ئازار، دەبوو كرێكاران و فەرمانبەران و مووچەخۆرانی كورد بگەڕێنەوە بۆ سەر ئیش و كارەكانی خۆیان، بەڵام حكومەتی بەعس لە كەركوك بەپێچەوانەی ئەوبەندەوە كاری دەكرد، دەستبەرداری كاری بەعەرەبكردنی كەركوك نەبوو و هەر لە ساڵی (١٩٧٠) ەوە دەستیكرد بە گواستنەوەی بەشێك لەكارمەندان و كرێكاران بۆ دەوروبەری شاری كەركوك.[105] بەپێچەوانەوە بۆ هێشتنەوەی كارمەندو كرێكارانی عەرەبیش بریارێكی دەركرد، كە تێیداهاتبوو:" لەبەر ئەوەی پارێزگاكانی باكوور پێویستیان بەفەرمانبەری نوێ هەیە، بۆیە ئەنجوومەنی سەركردایەتیی شۆڕش چەند بریارێكی دەركردووە كە وەزیفە شاغرەكان لە كوردستان نەكەوێتە بەر بریاری ئەنجومەن لەدامەزراندن و هەڵوەشاندنەوە).[106] لەنێوەرۆكی ئەمەدا ئەوە ئاشكرا دەبێت كە كوردستان بە گشتی و كەركوك بەتایبەتی، ئامادەیە بۆ رەخساندنی بواری كاركردن بۆ كرێكارو فەرمانبەرانی دەرەوەی ئەو ناوچانەش واتە (عەرەب).

سێیەم: بەپێی بەندی (٧) لیژنەیەك پێكدەهێنرا بۆ راپەراندنی كاروباری ناوچە كێشە لەسەرەكان، بەڵام حكومەتی بەعسی عێراق بەبەرێوەبردنی هاوبەش لە ناوچەی كەركوك و دەوروبەری و خانەقین و شەنگار رازی نەبوو، هیچ هەنگاوێكی لەبارەی بەرێوەبردنی هاوبەش لەو ناوچانەدا جێبەجێنەكرد.[107]

چوارەم: لەگەڵ ئەوەی بەشێك لەبەندەكانی پەیماننامەی

١١)ی ئازار جێبەجێکرابوو، بەڵام حکومەتی نێوەند لە جێبەجێکردنی بەندی (٨)کە پەیوەست بەگەڕاندنەوەی گوندنیشنە کوردو عەرەبەکان بۆ شوێنی پێشوویان و بەعەرەبکردنی ناوچەکانی باشووری کوردستانەوە بوو، کەمتەرخەمیی دەکردو جێبەجێنەکرا.[١٠٨] هێشتا چەند مانگێك بەسەر واژۆکردنی بەیانی ئازاردا تێنەپەڕی بوو، حکومەت دەستیکرد بەدرێژەدان بە عەرەبکردنی کەرکوك. [١٠٠] (ئینسکلۆپیدیای وڵاتی دانیمارك، زانکۆی کۆلۆمبیا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و دامەزراوی مایکرۆسۆفتی ئەمریکی)یش ئاماژەیان بەو سیاسەتەی حکومەتی بەعسی عێراق داوە، کە تیایدا هاتووە::" پاش ساڵی١٩٧٠ دەرکردنی کورد لە کەرکوك و هێنانی عەرەب بۆ جێگایان، بەمەبەستی کەمکردنەوەی ڕێژەی کورد و بەرزکردنەوەی ڕێژەی عەرەب لەبەرامبەردا بەردەوام بوو". [١١٠]

لە مانگی دوازدەی ساڵی ١٩٧١ دا ئاڵۆزیی نێوان سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد و ڕژێمی بەعسی عێراق، لەسەر جێبەجێنەکردنی بەندی (٨)و هەندێك بەندی دیکەی بەیانی ئازار، گەیشتە ترۆپك. پاش ئەوەی ڕژێمی بەعس داوایەکی مستەفا بارزانیی دایە دوواوە، کە هێزە جێگیرکراوەکانی نزیکی کەرکوك و ئەوسێ هەزار خانەوادە عەرەبەی لە کەرکوك نیشتەجێکراون، بکشێنەوە. [١١١] یەکێك لە لێکۆڵینەوەکان ئاماژەی بۆ ئەو بارودۆخە کردووە و تێیدا نووسراوە:" کاتێك کە سەرکرایەتی کوردی داوای لە حکومەتی عێراق دەکرد کە بەندەکانی ڕێککەوتنامەی ١١ئازار جێبەجێبکات، بەتایبەتی گەڕانەوەی دانیشتووانی هۆزە عەرەب و کوردەکان بۆ ناوچەکانی پێشوویان. کەچی دەسەڵاتداران بەردەوام لە دەستگرتن بەسەر زەویی دانیشتووانی کورد دا لە کەرکوك دەستیان هەڵنەگرت بیانووشیان کشتوکاڵکردن یان کردنی بەسەربازگەی سوپابوو، هەروەك چۆن ڕێگە بەهەزاران خێزانی کورد(لە گەڕەکی کۆماری) شاری کەرکوك کەنەدرا، خانووەکانیان دروستبکەنەوە، بەڵکو شارەکە بە گەڕەکی عەرەبی لە هێندراوەکانی پارێزگاکانی نێوەڕاست و باشووری عێراق دەورەدرا". [١١٢]سەرکردایەتیی کورد بەردەوام لە کۆبوونەوەکانی لەگەڵ حکومەتی بەعسی عێراقدا، هەوڵیداوە ئەوەبخاتە ڕوو کە ناوچە کوردییە کێشە لەسەرەکان و کەرکوك بخرێنەوە سەر کوردستان و عەرەبە هاوردەکانیش بگێڕدرێنەوە بۆ شوێنی پێشوویی خۆیان، بەڵام حکومەتی بەعس هیچ هەنگاوێکی ئەرێنی بۆ ئەوە نەناوە، بەڵکو بەپێچەوانەی ئەوە کاری دەکرد.

پێنجەم: لەبەندی ژمارە(١٤) ومادەیەکی نهێنیی پەیماننامەکە بەمەبەستی یەکلاکردنەوەی بابەتی ئەو ناوچانەی جێگەی ناکۆکی بوون (مەبەست پارێزگای کەرکوك و هەندێك ناوچەی تری وەك خانەقین و شەنگار و..... تاد..) بوو، دەبووایە سەرژمێریی تێیدابکرێت.[١١٣] ئەو سەرژمێرییە نەخشەی بۆدانرا، کەلە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٠ دا ئەنجام بدرێت، پاشتر بەرازیبوونی ئاشکرای هەردوولا دوواخرا بۆ بەهاری ساڵی ١٩٧٢ بۆئەوەی پێداویستییەکانی بۆ ئامادەبکرێت.[١١٤] بەڵام لەلایەن حکومەتی بەعسەوە بۆکاتێکی نادیار دواخرا.[١١٥] دیارە مەبەستیشی ئەوەبوو سەرژمێرییەکە، کە تەنیا ڕێگەچارەیەك بوو ئەو کێشانەی لەسەریان ڕێکنەکەوتبوون، بەتایبەتی پرسی کەرکوك و ناوچە نەوتییەکانی کوردستان بە ئەنجام نەگەیەنێت.[١١٦] پاش ساڵێك و پێنج مانگ بەسەردەرچوونی بەیانی ئازاردا تێپەڕبوو، گۆڤاری (ئەلحورییە) لە وتارێکیدا نووسیبووی:" یەکێك لەبەندە هەرە گرنگەکانی ڕێککەوتنی ١١ی ئازار، کە هێشتا جێبەجێنەکراوە، سەرژمێرییەکەی دانیشتووانی شاری کەرکوکە، ڕژێم ئاگایانەو بە ئارەزوو دوایخست".[١١٧]

سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد بەردەوام داوایدەکرد بەپێی بەندی (١٤)و بەندێکی نهێنیی بەیانی ١١ی ئازار، پێویستە سەرژمێریی دانیشتووان، لەشاری کەرکوك و ناوچە کێشە لەسەرەکان بکرێت، تاکو پەیماننامەی (١١)ی ئازار جێبەجێبکرێت.[١١٨] بەڵام حکومەتی بەعس ئەو داوایەی پشتگوێ خست و لە پرۆژەی پێشنیارکراوی پەیوەست بە دەستووری بنەڕەتی حیزبی بەعس لە ساڵی ١٩٧٣دا، سەبارەت بەپایتەخت(نێوەند)ی ناوچەی ئۆتۆنۆمی نووسرابوو: دەبێت پایتەختی ناوچەی ئۆتۆنۆمی (سلێمانی یان هەولێر یان دهۆك) بێت و کەرکوکی لەو سنوورە دەرکردووە.[١١٩] ئەمە بۆخۆی ئەوە دەردەخات کە حکومەتی بەعسی عێراق، لە بەندی (١٤)و یەکێك لە بەندە نهێنییەکانی بەیانی ئازار پەشیمانبووەتەوە یان هەر لە سەرەتاوە بەشێوەیەکی تاکتیکی بۆ ڕەزامەندیی سەرکردایەتیی کورد ئەو بەندانەی داناوە. ڕۆژنامەی (Neue Zurcher Zeitung) کە ئاگادارترین ڕۆژنامەی ئەورووپای ڕۆژئاوایە لە تێڕوانینی دۆزی کورد، سەبارەت بە بەیانی ١١ی ئازار و بەندەکانی نووسیویەتی: ڕەنگە ڕێککەوتنەکە تاکتیکی عێراق بێت، بەغداد لەم ڕێککەوتنەدا بەپلەی یەکەم ویستوویەتی دەستی ئێران لەنێو کورد و خاکی عێراق ببڕێت وهاوکات عێراق بەهیوایە کە سێ ملیۆن کوردی ئێرانیش لەلایەن خۆیانەوە داوای ئۆتۆنۆمی بکەن و ئاڵۆزی بۆ سیاسەتی نێودەوڵەتیی شا سازبێت.[١٢٠]

لەلایەکی ترەوە تۆماری سەرژمێری (سجل الاحصاء) ی ساڵی ١٩٥٧ لە پەیماننامەی ١١ئازاردا کرابووە سەنگی مەحەك و یەکلاکەرەوە،[١٢١] کە بەندو ماددەکانی ئەو سەرژمێرییە دەبێت بە بنچینەیەك بۆ دیاریکردنی سروشتی نەتەوەیی بۆ زۆرینەی ئەو نەتەوەیەی کە دانیشتووانەکەی لە شارێك یان لە ناوچە کێشە لەسەرەکان پترە. ئەمە هەردوو لایەنی حکومەتی عێراق و سەرکردایەتیی کورد لەسەری ڕێککەوتن. هەر لەو ڕێگەیەشەوە سنووری ناوچەی کوردستان دیاری دەکرێت و حکومی زاتیی پێدەبەخشرێت،[١٢٢] کەچی حکومەتی بەعس بەچەند مانگێك دوای بەیانی ئازار هەموو تۆماری سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ی گواستەوە بۆ بەغداد و کەوتە دەستکاریکردنی تەواوی تۆمارەکە بە جۆرێك کە لە بەرژەوەندیی نەتەوەیی عەرەبدا بێت... بۆیە لێرەدا دەتوانرێت بووەترێت، بەعس نەك هەر خۆی لە بەجێگەیاندنی بەندی (١٤)و خاڵە نهێنییەکانی دیکەی

تایبەت بە کەرکوک دەشاردەوە، بەڵکو چی لەدەستبهاتایە هەوڵیدەدا دیمۆگرافیای نەتەوەیی ئەو شارە بگۆڕێت.

شەشەم: بەپێی بەندێکی نهێنیی پەیماننامەی ١١ی ئازار، دیاریکردنی سنووری ناوچە کوردنشینەکان لەوانە پارێزگای کەرکوک، لە ڕێگای (ڕیفراندۆم)ەوە دیاری دەکرا،(١٢٣) بەڵام بوارنەدان بە ڕیفراندۆم و یەکلانەکردنەوەی پرسی سنووری کوردستان و شاری کەرکوک، جارێکی تر پێوەندییەکان نێوان حکومەتی عێراق وسەرکردایەتیی کوردی ئاڵۆز کرد وبەرەو شەڕێکی تری بردن.(١٢٤)

لەسەر پرسی کەرکوک تادەهات پێوەندی سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد وحکومەتی بەعس بەرەو ئاڵۆزی و خراپی دەچوو،(١٢٥) بۆچاکردنی ئەو بارودۆخە، پارتی دیموکراتی کوردستان لە ٩ی مارتی ساڵی ١٩٧٣دا ڕەشنووسی پرۆژەی ئۆتۆنۆمیی پێشکەشکرد، بەڵام حکومەتی عێراق بەو بیانووەی پرۆژەیەکی توندڕەو و بنبەستە، ڕازی نەبوون ببێتە بنەمایەك بۆ گفتوگۆکردن.(١٢٦) سەرۆککۆمار (ئەحمەد حەسەن بەکر) لەو نامەیەی کە لە (٤ی گەلاوێژی ساڵی ١٩٧٣)دا بۆ مستەفا بارزانی ناردبوو، ئاشکرای کردبوو ناتوانن بەو پرۆژەیەی کورد ڕازی بن، داواشی کردبوو چاوی پێدابخشێننەوەو پێشنیاری گونجاو بۆ گفتوگۆ لەسەرکردنیان پێشکەش بکەن. مستەفا بارزانیش، لە مانگی ئابدا بەنامەیەك وەڵامی سەرۆککۆماری دایەوە و داوای لێکرد سەرنجی خۆیان سەبارەت بەخاڵە پەسەند نەکراوەکانی پرۆژەی کورد بخەنەڕوو، تا لێیان وردببنەوەولەدووبارەدارشتنەوەی پێشنیارەکانیان بەشێوەیەك کەمایەی ڕەزامەندی وپەسەندکردنی هەمووان بێت، لەبەرچاویان بگرن.(١٢٧) لەلایەکی تریشەوە(حیزبی شوعیی عێراق) پرۆژەیەکی یاسای ئۆتۆنۆمیی پێشکەشکرد، بەڵام بەعس ئەو پرۆژەیەشی پشتگوێ خست، ئیدی حیزبی شیوعیش وازی لێهێنا و لەگەڵ بەعس بەشداری دارشتەیەکی هاوبەشی کرد بەناوی (بەرەی نیشتیمانی و نەتەوەیی پێشکەوتخوان).(١٢٨)(١٢٩)

دوای ڕەتکردنەوەی هەردوو پرۆژەی (پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعی عێراق)، لە ١٢ی کانوونی دووەمی ١٩٧٣ دا حکومەتی بەعس پرۆژەی خۆی بۆ ئۆتۆنۆمی پێشکەش سەرکردایەتیی کورد کرد، بەڵام سەرکردایەتیی کورد پرۆژەی حکومەتی بەعسی ڕەتکردەوە، لەبەر ئەوەی بەعس بۆ دیاریکردنی سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان سوربوو لەسەر گەڕانەوە بۆ تۆماری سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ کە لەلایەن سەرکردایەتیی کوردەوە ڕەتکرابووەوە.(١٣٠)چونکە لەگەڵ بەندی (١٤)ی بەیانی ئازار ناکۆك بوو. لەلایەکی تریشەوە حکومەتی بەعسی ئەوکات دەستکاریی تۆماری سەرژمێریی ساڵی ١٩٥٧ی کردبوو.

دوای گفتوگۆیەکی زۆر و نەگەیشتنەئەنجام، و دوا هەوڵ و کۆششێك لە بەغداد درا، لە١٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٤ لەنێوان نوێنەرانی بەعس و شیوعی و نەتەوەییە پێشکەوتنخوازەکان و نوێنەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان.(١٣١) بەڵام لەسەرەتای گفتوگۆکەوە کە کۆمەڵێك گرفت کەوتە نێوان نوێنەرانی پارتی و حیزبی بەعس، لەسەر پرسی (کەرکوک، دیموکراتییەت، هەڵبژاردنی پەرلەمان،(١٣٢) دیاریکردنی سنوور، ئاستی دەسەڵاتی یاسایی دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی، بەعەرەبکردنی ناوچەکانی کودستان، بوودجەی سەربەخۆ و بەشەداهاتی نەوت بۆ ناوچەکانی ئۆتۆنۆمی.. تاد... )(١٣٣) جێی ئاماژە پێدانە، شاری کەرکوك لە دیاریکردنی سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی کورستاندا گرفتی سەرەکی بوو. لەو پرسەشدا هەر لایەنێك پێشنیار و بۆچوونی جیاوازی خۆی هەبوو، حیزبی شیوعی پێشنیاریکرد کەرکوك بکرێتە شاری برایەتی و نەتەوەیی کارگێڕییەکی تایبەتی هەبێت و تیایدا نەتەوەکان بە مافە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکانیان شادبن. بۆ ئەو کارگێڕییەش پێشنیاری کرد لیژنەیەکی باڵا لە حیزبی بەعس و پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعی پێکبهێنرێت. بەڵام سەرکردایەتیی کورد بەو پێشنیارە ڕازی نەبوو و سوور بوو لەسەر ئەوەی کەرکوك لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا بێت، پێشنیاری بەعس دابەشکردنی شارەکە بوو، بەشی ڕۆژهەڵات (ڕۆژهەڵاتی پردی خاسە) بۆ کوردو بەشی ڕۆژئاواشی بۆ تورکمان دانابوو، ئەو پێشنیارەش لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە کورد ڕۆژێك دەرفەتی جیابوونەوە و پێکهینانی دەوڵەتی سەربەخۆی دەبێت.(١٣٤) بەعس دانووستانەکانی پچراندولە ٣ی ئازاری ١٩٧٤ دا ڕایگەیاند کە کۆتایی بەماوەی گواستنەوە هاتووە (کە بۆکاری سەرژمێری دیاریکرابوو)(١٣٥)، پاش ئەوە لە (٧ی ئازار)دا شاندێکی کوردی دەچن بۆ گفتوگۆ لەبارەی ڕاگەیاندنی ئۆتۆنۆمی، لەگەڵ سەددام کەوتنە وتووێژ، کە هاتنە سەرباسی کەرکوك، ئیدریس بارزانی وتوویەتی: دەست هەڵگرتن لە کەرکوك و خانەقین و شەنگار کارێکی لە کردن نەهاتووەو ناتوانین پەسەندی بکەین، لەگەڵ خستنەڕووی چەند پێشنیارێکی کورد بۆ چارەسەری پرسەکە، بەڵام سەددام لە وەڵامدا دەڵێت:" ئەو پێشنیارانە پەسەند نین و دەدرێنە دواوە تەنیا ڕێگەیەکتان ماوەتەوە ئەوەیە بە ئۆتۆنۆمی و بەو دارشتنەی ئێمە دامانناوە ڕازی بن، مۆڵەتی (١٥) ڕۆژتان هەیە لەو ماوەیەدا هیچ بزووتنەوە و کارێکمان نابێت، پاش ئەوەی پێی ڕازی نەبێت بەدوژمنی خۆمان لە قەڵەمی دەدەین".(١٣٦) بەو جۆرە گفتوگۆی نێوان سەرکردایەتیی پارتی و بەعس چووە نێو بازنەیەکی داخراوەوە، بەتایبەت دوای گەڕانەوەی ئیدریس بارزانی بەبێ ڕێککەوتن.(١٣٧)

سەرەنجام، (ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشی عێراق)لە ١١ ی ئازاری ساڵی ١٩٧٤دا بەخێرایی و یەکلایەنە یاسای ژمارە(٣٣)ی ئۆتۆنۆمی کوردستانی ڕاگەیاند.(١٣٨) یاسای ئۆتۆنۆمی دەرچوو هەر ئەو ناوچانەی خود بەڕێوەبردنی ساڵی ١٩٧٠ ی دەگرتەوە, یاسای ئۆتۆنۆمی دیاریکردنی سنوورەکانی بەجێهێشت بۆ سەرژمێرییەك (تا ئەو سەرژمێرییە بڕیار بدات)، بەڵام ئەوەی ئاشکرا بوو کەرکوك لە سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا نەبوو، (سلێمانی و هەولێر و دهۆك) بەشێك بوون لە ناوچە سەرەکییەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی و(هەولێر) یش بەنێوەندەکەی دانرا.(١٣٩)چەندناوچەیەکی باشووری کوردستان لەگەڵ کەرکوك

نەکەوتبوونە نێو هەرێمی ئۆتۆنۆمییەوە، وەك (خانەقین، مەندەلی، شەنگار، شێخان، کفری، ئاکری، دووبز، شوان، جەبارە، سەرقەلا، نەوجوول، قادر کەرەم، کوکس، زمار... تاد... )[١٤٠]. بەپێی ئەو سنوورەی کە یاسای ژمارە(٣٣) بۆ ناوچە ئۆتۆنۆمیی داناو بەعس بە کوردستانی لەقەڵەمدا، تەنیا(٣٦٣٤٧کچگ)ی باشووری کوردستانی دەگرتەوەو(٤٨٦٥٣کچگ)ی لەخاکی باشووری کوردستانی دابڕی، کە زۆربەی ناوچە ستراتیژییەکان بوون.[١٤١] واتە(٤٢. ٦٪) بە کوردستان دانراو(٥٧. ٠٤٪) لێ دابڕا.

دوای ڕاگەیاندنی یاسای ئۆتۆنۆمی، حکومەتی بەعسی عێراق ماوەی (١٥)ڕۆژی بۆ مستەفا بارزانی دانا، تا ئەو یاسایە پەسەند بکات. [١٤٢]دیارە بەندەکانی ئەو یاسایە مایەی ناکۆکی بوون، چونکە داخوازییەکانی کوردی لەمەڕ کەرکوك و نێوەندی دەسەڵاتی تێیدا نەبوون، هەر بۆیە مستەفا بارزانی ئەو یاسایەی ڕەتکردەوە و بۆ جارێکی تر شەڕ لە کوردستان هەڵگیرسایەوە. لەم شەڕەدا کورد تووشی نسکۆ هات، بەتایبەتی دوای ڕێککەوتننامە جەزائیر[١٤٣]ی نێوان(ئێران و عێراق) لە ٦ی ئاداری ساڵی ١٩٧٥.

بە شرۆڤەکردنی ڕاگەیاندنی پەیماننامەی ١١ی ئازارو وەستاندنی شەڕ بۆ چوار ساڵ و پاشتر بڵاوکردنەوەی یاسای ژمارە(٣٣)ی ئۆتۆنۆمی ساڵی١٩٧٤، ئەمانە بەرجەستە دەبێت:

یەکەم: لەکاتی ڕاگەیاندنی پەیماننامەی ١١ی ئازاردا، حکومەتی بەعس دەیویست ئۆتۆنۆمییەکی کارگێڕیی بداتە بەشێك لە کوردەکانی باشوور، لە پارێزگاکانی (هەولێر و سلێمانی و دهۆك)، چونکە لە دیدی ناسیۆنالیستی عەرەب بەگشتی و بەعس بەتایبەتی کورد نەتەوەیەکی سەربەخۆی خاوەن خاك و نیشتیمان نییە، کە مافی سەربەخۆیی و ئازادیی خۆی هەبێت، بەڵکو وەك خەڵکێك لە قەڵەمدراوە، کە هاتوونەتە سەر خاکی عەرەب ولەسەر ئەو خاکە میوانن. بۆیە دەبێت هەڵسوکەوتێك نەکات کە زیان بە بەرژەوەندییە باڵاکانی نەتەوەی عەرەب بگەیەنێت. هەروەها نابێت مافی ئەوەی هەبێت سامانی ئەو خاکەی کە کورد بە خاکی نەتەوەیی و نیشتیمانی خۆی دەزانێت و ئەوانیش بە بەشێك لە خاکی عەرەبی دەزانن، بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری بهێنێن. واتە کوردی باشوور لەلایەن بەعسییە عەرەبەکانەوە وەك بێگانە لەسەر خاکی عێراق سەیر دەکرا.

دووەم: کێشەی کەرکوکی دەوڵەمەند بەنەوت، لەو کێشە ئاڵۆزانەبوو کەبەبێ چارەسەر لەبەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠دا ماوەتەوە، زاراوەی ناوچەکانی (زۆرینەی کورد)کە دەکرا کێشەی کەرکوك چارەسەربکات وەك بەشێك لە پەیماننامەکە، زاراوەیەکی لاستیکی بوو و حکومەتی بەعس لە بەیاننامەی ئازاردا کە هاتبووبە گوێرەی بەرەژوەندییەکانی خۆی پێناسەی دەکرد.

سێیەم: وەستاندنی شەڕ بۆ چوار ساڵ بەپێی بەیانی ١١ی ئازار، ڕێگەدان بووبە حکومەتی بەعسی دوژمنی جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد، کە بە ئارەزووی خۆیان بتوانن ڕیزەکانی خۆیان کۆبکەنەوە و جێپێیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی دژوارتر و خوێناوی ترقایم بکەن. ئەویش بوو بەڕاستییەك لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا بەعس توانیان ڕەگوڕیشەی خۆیان دابخەنە نێو ڕیزەکانی کۆمەڵ و چەکدارانی کورد بە مەبەستی تێکدان و خراپەکاری و ئەوەش ببووە دیاردەیەك و ناشاردرێتەوە، ئەو چوارساڵەی شەڕ وەستاندن هەلێکی لەباربوو بۆ حکومەتی بەعس لە جێبەجێکردنی سیاسەتی بەعەرەبکردن و ڕاگواستن و بەعساندنی شاری کەرکوکدا.

چوارەم: بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بەشێوەی سیاسی و چەکداری دەستی پێکرد، دروشمی داواکارییەکانی بەردەوام کەرکوکی گرتووەتە خۆی و لە دانووستانەکاندا دۆزی کەرکوك بووەتە کێشە و نێوەندی پرسەکەو هەرگیز لەداواکردنی ئەم شارە دووانەکەوتووە و ناکۆکیی نێوان حکومەتی نێوەند وشۆڕشی کورد لەسەر ئەم پرسەبوو. هەموو ڕێککەوتنێکی کوردی باشوور لەگەڵ حکومەتی نێوەندا لەسەر کێشەی کەرکوك هەڵوەشاوەتەوە، پەیماننامەی ١١ی ئازاریش هۆکاری بەئاکام نەگەیشتنی لەسەر شاری کەرکوك بوو.

*** نەوتی کەرکوك و پرۆسەی خۆماڵیکردنی ساڵی ۱۹۷۲**

لەسەرەتای ساڵانی سەدەی بیستدا، کۆمپانیا و کارگە نەوتییەکانی جیهان لە ڕووی بەرهەمهێنانیان و توانایی دامەزراوەکانیان بەشێوەیەکی بەرچاوگەورە و فراوان دەبوون.[١٤٤] پێویستیان بەکێڵگەی نەوتی نوێ بوو، لەو دەمەدا ناوچە نەوتییەکانی کوردستان بەگشتی و باشووری کوردستان و کەرکوك بەتایبەتی، کۆمپانییە مۆنۆپۆلەکانی نەوتی بۆلای خۆی ڕاکێشا.[١٤٥] ئەوی پتر ڕێگە خۆشکەر بوو بۆ هاتنی کۆمپانییەکانی نەوت، دەسەڵاتی لەرزۆکی عوسمانییەکان بوو، کە هەمیشە لە تەنگژەی سیاسی و داراییدا بوون لە هەلپەی پەیداکردن و بەدەستهێنانی داهاتی تازەدا بوون. یەکێك لە کاراکتەرەکانی مەیدانی ئەم ململانێیانە، گرووپێکی ئەڵمانیی بوون کە لەلایەن (دۆیچە بانك)ەوە سەرۆکایەتی دەکراو هەوڵیدەدا دەسترۆیی و هەڵکەوتی ئەڵمانەکان لە خورهەڵاتی نێوەند بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی بەهێز بکات. لەبەرامبەر ئەم گرووپەشدا، دژە گرووپێك بەسەرۆکایەتیی (ویلیام ئوکس دارس)چالاکانە کاریدەکرد، کە سەرەنجام توانیی جیاوگی نەوت لە ئێران بەناوی کۆمپانیای نەوتی (بەریتانیا و ئێران) بە دەستبهێنێت. هەروەها حکومەتی لەندەن ئەم هەلەی قۆستەوە و ئەو کۆمپانیایەی وەك کارتێکی هاوتاکردن لەبەرامبەر دەسەڵاتی ئەڵمانەکان لە خۆرهەڵاتی نێوەندا قوتکردەوە.[١٤٦] گەرچی لە ساڵی ۱۹۰۱ دا جارێکی دیکە ئەڵمانەکان شاندێکی پسپۆڕیان ناردە ناوچەی (کەرکوك) بۆ ئەوەی ڕاستیی بوونی نەوت لەناوچەکەدا بسەلمێنن، ئەوانیش هەروەك دەستە و تیمەکانی پێش خۆیان بوونی نەوتیان لە ناوچەکەدا پشتڕاستکردەوە، بەڵام وتیان" بڕی نەوتەکە کەمە و بەکەڵکی بازرگانی نایەت".[١٤٧] لەگەڵ ئەوەشدا شاندەکە بەپێی ئەو ڕاپۆرتە ئامۆژگاری وڵاتەکەی کردبوو، کە هەرچی زووە هەوڵی بەدەستهێنانی جیاوگی دەرهێنانی نەوت بدرێت. لەم ڕووەوە دکتۆر (ڕوهر باخ) سەردانی ناوچەی کەرکوکی کرد و دروستیی نێوەڕۆکی ڕاپۆرتی شاندە ئەڵمانیەکەی بۆ ساغ بووەوە. ئەوەندەی نەخایەند (بانکی ئەڵمانیا) ڕەزامەندیی (باب العالی) بەدەستهێنا سەبارەت بە ڕووپێوکردنی ناوچە نەوتییەکانی ویلایەتی موسڵی ئەوسا بەمەرجێك ڕێککەوتننامەیەك لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا واژۆ بکات، بەڵام بەهۆی سەرقاڵیی بانکی نێوبراوەوە بە پرۆژەی هێڵی ئاسنی نێوان(بەرلین- بەغدا)ەوە، نەیتوانی بپەرژێتە سەرئەنجامدانی پرۆژەی نەوتەکە. [١٤٨]سەرەنجام لەڕۆژی (٥ ئازاری ۱۹۰۳)دا دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ کۆمپانیای(هێڵی ئاسنی ئەنادۆڵ) [١٤٩] کەبانکی ئەڵمانی خاوەنی بوو، سەبارەت بە ڕاکێشانی هێڵی ئاسنی (بەرلین- بەغدا)ڕێککەوتنامەیەکی واژۆ کردو لە مادەی (۲۲)یدا هاتبوو:" مافی سەرمایە گوزارییکردنی هەموو چاڵەنەوتییەکانی ئەمبەر و ئەو بەری ئەم هێڵی ئاسنینە بەدرێژایی (۲٥کم)بە کۆمپانیای(هێڵی ئەنادۆڵ)دەبەخشێت، بەمەرجێك کۆمپانیاکە یاسا و سیستێمە پەیوەندارەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیە پیادە بکات".[١٥٠] یەکسەر دەست بە دۆزینەوەی نەوتیش بکات.[١٥١] بەو شێوەیە بانکی ئەڵمانیا مافی گەڕان و پشکنینی بەدوای نەوتی هەردوو ویلایەتی (مووسڵ و بەغداد)ی بەدەستکەوت، بەڵام لە ساڵی (۱۹۰٦)دا ئەو مافەی لێوەرگیرایەوە، بەهۆی سەرقاڵبوون و جێبەجێکردنی پڕۆژەی هێڵی ئاسنی (بەغداد- بەرلین)ەوە، نەیتوانی پرۆسەی گەڕان و پشکنینی نەوت دەستپێبکات، کە دەبوو لەگەڵ وەرگرتنی ئەو مافەدا دەستبەکاربێت.[١٥٢] لەلایەکی دیکەشەوە ئینگلیزەکانیش دەستیان لە هەڵوەشاندنەوەیدا هەبوو.[١٥٣] لە گەرمەی مشتومڕو ململانێی نێوان ئەڵمان و ئینگلیزەکان، دوو هێزی دیکە لەسەر نەوتی ناوچەکەهاتنە ململانی، یەکەمیان کۆمپانیایەکی (ئینگلیزی - هۆڵەندی)بوو بەناوی کۆمپانیای (ڕۆیال- دوچ شل)کە لە ساڵی ۱۹۰۷ دا وەك لایەنێکی دیکەی کێبرکێکەر بەدیارکەوت و دووەمیان لە ساڵی ۱۹۰۸ دابوو، کاتێك ئەمریکا توانی لە ڕێگەی نوێنەرەکەیان (گوڵبی مشیل چستەر) بە پشیتوانیی ژووری بازرگانیی نیۆرك و سەرۆکی ئەمریکا، ڕەزامەندیی سەرەتایی لە سوڵتانی عوسمانی بۆ گەڕان بەدوای نەوتی کوردستان، لە هەردوو دیوی هێڵی ئاسنی (کەرکوك- مووسڵ) بەدەستبهێنێت، بەمەش ویلایەتی مووسڵ کەوتە ژێر دەستی سەرمایە گوزاری ئەمریکاوە.[١٥٤] لێرەوە کێبرکێیەکی نێودەوڵەتی لەسەر نەوتی (کەرکوك) لەنێوان دەوڵەتاندا دەستپێکرد، لەو کێبرکێییەدا هەریەکە لە (ئەڵمانیا و بەریتانیاو ئەمریکا و فەرەنسا و تورکیا) بەشداربوون،[١٥٥] بەهۆی دۆزینەوەی نەوتێکی زۆر لەو شارەدا بەتەواوەتی.[١٥٦] لە ساڵی ۱۹۰۸ دا سوڵتانی عوسمانی گرەنتیی جیاوکی نەوتی دا بە کۆمپانیای (ولیەم دارسی) بۆ گەڕان بەدوای نەوتدا، لە ساڵی ۱۹۰۹ دا حکومەتی تورکیا ئەو گەڕانەی بۆ وەزارەتی کانگەکانی گواستەوە. [١٥٧] لە ساڵی ۱۹۱۰ دا بەسەرۆکایەتی ئینگلیز، بانکی ئەهلیی تورکی دامەزرا، کە(گۆڵبەنکیان ئەرمەنی) بەڕێوەبەری ئەو بانکە بوو، دواتر ئەوانیش لە ڕێگەی بەڕێوەبەرەکەیانەوە توانییان جیاوگی بەشێکی گرنگی نەوتی ویلایەتی مووسڵ بەدەستبهێنن. [١٥٨]

بەر لە دەستپێکردنی جەنگی یەکەمی جیهانی لە ساڵی ۱۹۱٤دا، بۆ قۆرخکردنی نەوتی باشووری کوردستان و کەرکوك، ڕێککەوتنێك لەنێوان بانکی تورکیا بەسەرمایەی (ئینگلین)و بانکی ئەڵمانیا(خاوەنی کۆمپانیای هێڵی شەمەندەفەری ئەنادۆڵ)، بۆ پێکهێنانی کۆمپانیایەکی هاوبەش واژۆکرا، سەرەنجام لە ساڵی ۱۹۱۱ دا کۆمپانیایەك بەناوی (کۆمپانیای جیاکاری ئەفریقای ڕۆژهەت – Africa and eastern concession) دروستکراو دواتر لە ساڵی ۱۹۱۲ دا نێوەکەی بۆ (کۆمپانیای نەوتی تورکیای سنووردار– Turkish petroleum co. Ltd .)گۆڕرا[١٥٩].
ئەوکات بەپشتیوانی هەردوو حکومەتی (بەریتانیا و ئەڵمانیا)توانی لە (۱۹ی حوزەیرانی ساڵی ۱۹۱٤) دا گفتێك لە سەدری ئەعزەم (سەعید حەکیم پاشا) وەرگرێت، بۆ دۆزینەوەی نەوتی باشووری کوردستان و کەرکوك.[١٦٠]

کاتێك لە ڕۆژی (۱ی ئابی ساڵی ۱۹۱٤)دا جەنگی

جیهانی یەکەم بەرپابوو و تا ساڵی ١٩١٨ درێژەی کێشاو ئەورووپا و ئاسیا و باکووری ئەفریقاشی گرتەوە، ئیدی ڕۆڵە ژیارییەکانی نەوت لە هەموو کاتێکی دیکە پتر دەرکەوت، چ لە بەکارهێنانی کارە مەدەنییەکاندا بێت یاخود لە بایەخی جەنگی و سیاسییە ستراتیژییەکانەوە بێت.[161] هەر لەبەر ئەوە و چەند هۆکارێکی دیکەی ئیمپریالیست بوو، کە پەیماننامەی نهێنیی (سایکس پیکۆ- سازەنۆف)[162] لە ساڵی ١٩١٦ دا لەنێوان (بەریتانیا و فەرەنساو رووسیا) دا. بەمەبەستی دابەشکردنی ناوچە گرنگ و پیترۆڵییەکانی دەوڵەتی عوسمانی واژۆکرا، کە باشووری کوردستان (ویلایەتی مووسڵ) لەو دابەشبوونەدا کەوتە ناوچەی بەرژەوەندییەکانی فەرەنساوە.[163] هەرچەندە هەندێك پێیانوایە ئیمپراتۆرییەتی بەریتانیا ناوچە نەوتییەکانی کردبووە سەنتەری بەرژەوەندییە باڵاکانی خۆی.[164] واتە لەویلایەتی مووسڵدا باسی کەرکوك بۆ فەرەنسا نەکرابوو و دواتریش هێزەکانی لەدوای واژۆکردنی (مۆدرۆست) و لەمانگی یازدەی ساڵی ١٩١٨ دا، بەتەواوی ویلایەتی مووسڵیان بەشاری کەرکوکیشەوە داگیرکرد.[165] (پرۆفیسۆر کمال مەجید) لەو بارەیەوە، نووسیویەتی:" بوونی نەوتی کەرکوك سوپای ئینگلیزی هاندا کە ئاگربەست بشکێنن و دەست بەسەر هەموو ئەو ناوچانەدا بگرن، کەدەکەونە باشووری زێ ی خابوورەوە".[166]

سەرەنجامی تێکشکانی بەرەی نێوەندو ئەڵمانیا لە جەنگداو داگیرکاری هێزی سوپای هاوپەیمانان بۆ ناوچەی (وویلایەتی مووسڵ)، جێ پێی ئەڵمانەکانی لەململانێ لەسەر نەوتی ناوچەکە لاوازکردو بەریتانیا و فەرەنسا جێگەیان گرتەوە.[167] واتە ئەڵمانیا وبەرەی نێوەند لەهاوکێشەکە چوونەدەرەوە و ئینگلیز وفەرەنسا لەلایەك و ئەمریکا لەلایەکی دیکەوە بۆ نەوتی ویلایەتی مووسڵ و کەرکوك هەوڵیاندەدا. هەرچەندە لەوکاتەدا بەریتانیا دەیویست ئەمریکا نەکاتە هاوکێشەکەوە.[168] بەو شێوەیە ئەو ڕاستییە بەرجەستە دەبێت کە گرنگترین ئامانجەکانی جەنگی یەکەمی جیهان، بەرامبەری دابەشکردنەوەی جیهان بوو لەسەر خواستی گەورە دەوڵەتان، کەلەساڵانی جەنگدا چاویان تێبری بوو، بەپلەی یەکەمیش ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی لە بواری ئابووری و سەرچاوەی پترۆڵدا هەیبوو.. لەلایەکی دیکەوە بەریتانیا هەوڵی لکاندنی ویلایەتی مووسڵ (باشووری کوردستان)ی دەدا بەوڵاتی عێراقی تازە دروستبووەوە،[169] لەبەر ئەوەی لەو ڕێگەیەوە دەیویست نەوتی ویلایەتی مووسڵ و کەرکوك بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە.

کاتێك ویلایەتی مووسڵ (باشووری کوردستان) لەباکووری کوردستان جیاکرایەوەو خرایە سەر عێراقی عەرەبی،[170] کۆبونەوەیەکی سێ قۆڵی لەنێوان (تورکیا و عێراق و بەریتانیا) کراولە ڕۆژی (٥)ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٦)دا پەیماننامەیەك لەنێوانیاندا واژۆ کرا، بەپێی ئەو پەیمانە تورکیا بەفەرمی دەستبەرداری (ویلایەتی مووسڵ) بوو، لەبەرامبەر ئەم کارەشدا لەسەدا دەی (١٠٪)ی سوودی نەوتی دەرهێنراوی ناوچەی مووسڵ و بەغداد وەردەگرێت بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ. لەگەڵ ئەمەشدا ئەو ڕێککەوتننامەیە بۆ کۆمپانیا ئەمریکاییەکانیش (٢٣. ٧٥٪)ی پشکی لە کۆمپانیای نەوتی تورکیادا هەبێت، هەروەها کۆمپانیاکانی فەرەنساو کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی فارس، هەریەکە بەرێژەی (٧٥. ٢٣٪) پشکیان هەبێت و لە(٥٪) پشی بەشی (مستەر کۆڵبنکیانی)[171]ی ئەرمەنی بێت.[172] (عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی)یش لەو بارەیەوە نووسیویەتی:" حکومەتی عێراق بۆی ڕوون بووەوە کە کۆمەڵەی گەلان، ڕێگە بە ویلایەتی مووسڵ نادات کە وەك بەشێکی عێراق بمێنیتەوە ئەگەر بێتو جیاوکی گەران و پشکنینن بە کۆمپانیای نەوتی تورکی[*] لە هەردوو ویلایەتی موسل و بەغداد نەبەخشێت ".[173] پاش لکاندنی ویلایەتی مووسڵ بە عێراقەوە، کۆمپانیاکانی (بەریتانیاو فەرەنسا و هۆڵەنداو تورکیا و عێراق) کەوتنە پشکینینی بەردەوام بۆ تەواو ساغ بوونەوەی نەوتی ناوچەکانی (ویلایەتی مووسڵ- باشووری کوردستان)، دوای دەرکەوتنی نەوتێکی زۆر لە کەرکوك، (تیگل) بۆی دەرکەوت کە هیچ ڕێگە چارەیەکی نییە، جگە لە سازشکردن لەگەڵ (گوڵبەنکیان)و دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەك بەدڵی ئەو. ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەڵگەی ئەوەبوو کە گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە لەڕووی بارزگانییەوە لەمە پتر دوواخستنی ڕەوا نییە. هاوکات دانووستان لەگەڵ گوڵبەنگیانیش دەستپێکردووەو(تیگل)بە وریاییەوە چرای سەوزی نیشتیمانی نێوبراودا، سەرەنجام سیمای ڕێککەوتنی دەرهێنانی نەوت دەرکەوت.[174]

کۆمپانیای نەوتی تورکی(.Turkish petroleum co) لە ساڵی ١٩٢٧ دا دەستی بە هەڵکەندنی بیر لە چەند ناوچەیەکی جودای کەرکوکدا کرد[175]. سەرەنجام لە یەکێك لە ناوچەکانی بیر هەڵکەندن بەناوی بابەگوڕگوڕ، کە دەکەوێتە(١٠-١١) کیلۆمەتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوکەوە،[176] تێبینی کرا نزیکەی (٣٠) کون لەزەوی ناوچەکەدا هەیەوماوەی هەزاران ساڵە گازی سروشتی لێدێتە دەرەوە و بەردەوام دەسووتێت... هەر لەو جێگایەدا کاتژمێر سێی پاش نێوەڕۆی ڕۆژی (١٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٧) لەبیری ژمارە یەکی بابەگوڕگوڕ لە قووڵایی (١٥٢١) پێدا، تەقینەوەیەکی ترسناك ڕوویدا، کە لە سەرتاسەری دەشتایی ئەو دەورووبەرەدا دەنگیدایەوە، پاش تەقینەوەکە ئافوورەیەکی (٥٠)پێیی واتا(٢٥م) نەوت بەرزبیووەوە و سەری ئەسکەلەی بیرهەڵکەندنەکەی گرتەوە و لەگەڵ خۆیدا بەردی قوڵایی نێو زەویشی فڕێدایە دەرەوە، تەواوی ئەو دەوروبەری بەجارێ نەوتاوی کرد و سەرەنجام دۆڵ نشێوەکانی پڕگازی ژەهراوی کرد. بەو شێوەیە پێکهاتە نەوتییەکان و گازی ژەهراوی، مەترسی بۆ گوندەکانی ناوچەکە دروستکرد و خودی کەرکوکیش کەوتە مەترسییەوە،[177] چونکە وەرزی زستانبوو، ئەگەر لەو ماوەیەدا باران بباریایە ئەوا نەوتەکە لەگەڵ ئاوی زێی بچووکدا تێکەڵدەبوو. بەوەش ئاوی ڕووباری دیجلە تا(شط العرب) دەبووە نەوتی ڕەش.[178] بۆیە بە هەوڵ و تەقەلای پسپۆر و کارمەندانی نەوت و دەسەڵاتدارانی

کەرکوك، توانرا(٧٠٠)کەس لە دانیشتووانی ناوچەکە ئامادە بکات تا دەست بەدروستکردنی دیوار و هەڵکەندنی حەوزی بچووك بکەن و ڕێ لە بەفێڕۆ ڕۆیشتنی نەوتی خاو بگرن. سەرەنجام پاش (٨)ڕۆژ، توانرا کۆنترۆڵی ئەو بیرە سەرکێشە بکرێت. بەدرێژایی ئەو ماوەیە تا داخستنی سەری بیرەکە، ڕۆژانە(٨٠-٩٠)هەزار بەرمیل نەوتی خاو لەو بیرەوە هەڵدەقوڵایە سەر زەوی.[١٧٩] ئەمەش بووە هۆی دروستبوونی دەریاچەیەکی نەوت کە ڕووبەرەکەی (١٠٠٠پێ)دەبوو.[١٨٠] لێرەوە نەوتی کەرکوك گەیشتە ئەو ئاستەی کە بۆ بازرگانی بشێت.[١٨١] هەر بۆیە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٢٧بۆ ١٩٣٧) کاری سەرەکیی کۆمپانیای نەوت بریتیبوو لە چاڵهەڵکەندن و لێکۆڵینەوەی جیۆلۆجی و ئامادەکردنی پێداویستییەکانی دیکەی وەك عەمار دروستکردن و وەرشەی کارو خانووکردن بۆ ئەوانەی لەوێ کاردەکەن، بەتایبەت بۆ بێگانەکان.[١٨٢] لەلایەکی دیکەشەوەسیاسەتی ئەوکات بەجۆرێك بوو کە ڕۆڵێکی فراوان بە کورد و تورکمانی ناو کەرکوك و خەڵکی گەرمیان نەدرێ بین بە کرێکار، بەڵکو لە بەغداد و بەسراوە زۆر لە نۆکەرانی سەر بە خۆیان هەڵئەبژارد و لە زۆڵە کورد و زۆڵە تورکمان و زۆڵە ئاسووری و زۆڵە عەرەب و زۆڵە فارس، کە پشتیان کردبووە ڕەگەزی خۆیان، ئەوانەیان هێنا لە کۆمپانیای نەوت دایانمەزراندن. پاشتر شارێکیان بەناوی (ئەرەفە- عەرەفە) بەیادی کۆنی (ئارابخە)وە بۆ دروستکردن، بەڵام عەرەبی حەویجە کۆچەرو دەوارنشین بوون، لێیان دەترسان، لەبەر ئەوە پاسەوانی کۆمپانیای نەوتی سپارد بە (شێخ حەسەن عاسی عەلی)ی ناوێك، کە ئەویش دەیزانی کورانی حەویجە لێیان ناوەشێتەوە پاسەوانی بکەن، بۆیە سپاردی بە کوردو تورکمانەکانی ناوچەکە بەخاترانە بێت یاخود بە بەرتیل.[١٨٣]

پاش دانووستانێکی دوورودرێژلەنێوان سەرجەم ئەندامە جیاوازەکان لەکۆمپانیای نەوتی تورکی، بڕیاریاندا سیاسەتی دەرکەی ئاواڵا دابخەن کە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٢٢دا ڕایگەیاندبوو، ئەوداخستنەش بەشێوەیەکی تەواو بێت بەرووی ئەو ئەندامانەی کە لە کۆمپانیای نەوتی تورکی کاردەکەن. ئەو ڕێککەوتننامەیش[١٨٤] لە ڕۆژی (٣١ی گەلاوێژی ساڵی ١٩٢٨) واتە پاش نۆمانگ لە یەکەمین هەڵقوڵانی نەوتی کەرکوك، واژۆکراو هەریەکە لە کۆمپانیای (ڕۆیاڵ وۆچ- شێل) و کۆمپانیای نەوتی (بەریتانیا- ئێرانی) و کۆمپانیای نەوتی فەرەنسا و کۆمپانیای پەرەپێدانی نەوتی خۆرهەڵاتی نزیك، کەئەم جارەیان بەنوێنەرایەتی کۆمپانیای ئەمریکاییەکان پێکهێنرابوو.[١٨٥] لەژێر فشاری ئەمریکاییەکانیشدا بوو بەریتانیا ناچاربوو سەرلەنوێ پشکەکانی کۆمپانیای نەوتی تورکی بەم شێوەیە دابەش بکاتەوە:-

١- کۆمپانیای نەوتی (ئەنگلۆ- فارسی) ٧٥,٢٣.

٢-کۆمپانیای نەوتی (ڕۆیاڵ دۆچ-شێل)(بەریتانیا[١٨٦]+ هۆڵەند) ٧٥,٢٣٪.

٣- کۆمپانیای نەوتی فەرەنسی(فەرەنسا)٧٥,٢٣٪.

٤- کۆمپانیای سەرمایەگوزاریی خۆرهەڵاتی نزیك(کۆمەڵەی کۆمپانیای ئەمریکا) ٧٥,٢٣٪.

٥-کۆمپانیای هاوکاری سەرمایە گوزاری سنووردار (گۆڵبەنکیان) ٥٪[١٨٧]

بەڵام داواتر لە(٧ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٩)دا ناوی (کۆمپانیای نەوتی تورکی)گۆڕدرا بە (کۆمپانیای نەوتی سنوورداری عێراق -Iraq petroleum comany)[١٨٨] کە سوودەکەی بەم شێوەیە دابەشکرایەوە:" کۆمپانیای شڵی هۆڵەندی مەلەکی و بەریتانی ٧٥,٢٣٪ کۆمپانیای نەوتی بەریتانی ئێرانی دیاریکراوی پێشوو٧٥,٢٣٪، کۆمپانیای نەوتی فەرەنسی ٧٥,٢٣٪، کۆمپانیای (ئینمار)ی ڕۆژهەڵاتی نزیك (ئەمریکی)یش ٨٧٥,١١٪ ی بۆ کۆمپانیای ستاندار ئۆیەڵ (نیوجەرسی)و٨٧٥,١١٪ بۆ کۆمپانیای سکۆنی فکۆم ئۆیەڵ، (س ی، ئای سی. کونبکیان)ی ئەرمەنی - تورکی بەرەگەزیش ٥٪ بەرکەوت".[١٨٩] شاری کەرکوك بووە بارەگای سەرەکی ئەم کۆمپانیایە وئەوەش هەنگاوی یەکەم بوو بۆ بەعەرەبکردنی ئەم شارە، لە کاتێکدا کۆمپانیاکە پێویستی بەدەستی کارکەر هەبوو، عەرەب بەشی زۆرینەیان پێکدەهێنا.[١٩٠] لەلایەکی دیکەوە هەر لە ساڵی (١٩٢٩) دا بوو کە لە ناوچەی ژمارە هەشتی[١٩١] چاڵەنەوتییەکانی کەرکوك، یەکەم پاڵاوگەی نەوت لەو ناوچەیەدا بۆ جیاکردنەوەی بەرووبوومەکانی نەوت بەناوی (پاڵاوگەی باوە گورگور)ەوە دامەزرا.[١٩٢] پاش ئەم پاڵاوگەیە هەوڵەکانی بەریتانیا لەپێناو پێشخستنی کۆمپانیای نەوتی عێراقی وایکرد لە ساڵی ١٩٣٢ دا لەنێوان حکومەتی عێراق و کۆمپانیای نەوتی عێراقدا پەیمانێك لەبارەی نەوتی مووسڵ بە کەرکوکیشەوە واژۆ بکرێت، کەماوەی کارکردنی تاساڵی ٢٠٠٥ درێژەی هەبێت.[١٩٣] ئەوەش بناغەیەکی باش بوو بۆ بردنی هەزاران عەرەب لە عەشیرەتە جیاجیاکان بۆشاری کەرکوك، بەمەبەستی بە عەرەبکردنی ئەوشارە لەڕێگەی کۆمپانیای نەوتی عێراقییەوە.

بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیای نەوتی عێراق، بۆ یەکەم جار لە مایسی ساڵی ١٩٣٤ دا دەستی بە ناردنی نەوتی کەرکوك لەکێڵگە نەوتییەکانی (سارەلوو، باوەگورگور، هەنجیرە) ەوە کرد بۆ دەرەوەی وڵات بەمەبەستی بازرگانی لەڕێگەی (کەنارەکانی دەریای نێوەراست و حەیفاو تەرابلوس) بری (٥٠٠٠)هەزار بەرمیل لە ڕۆژێکدا.[١٩٤] لە ساڵی ١٩٣٥ دا ناردنە دەرەوەی نەوتی کەرکوك بەهێڵێکی جووت لوولەیی لە کەرکوکەوە بۆ گواستنەوەی نەوتی خاو بۆ بەندەرەکانی (حەیفا و تەرابلوس)[١٩٥]لەسەر کەناری دەریای سپی ناوەراست کرایەوە، کە هێڵی (کەرکوك - حەیفا)یەو درێژییەکەی (١٠٠٨)کیلۆمەترەو هێڵی (کەرکوك-تەرابلوس) یش درێژییەکەی (٨٥٠)کیلۆمەترە. بەم شێوەیە بەرهەمی نەوتی کەرکوك لە ساڵی ١٩٣٥ دا دەگەیشتە (٤ملیۆن) تەن، کە نێردرابووە بازارەکانی ئەورووپا.[١٩٦] لێرەوە بری بەرهەمهێنانی نەوتی کەرکوك لەنێوان ساڵانی (١٩٣٤) بۆ (١٩٣٨) بەرەو زیادبوون دەچوو بەهۆی دۆزینەوەی بیری پتر لەو مەیدانە و باشتر بوونی کەرەستەی دەرهێنان و گەشەسەندنی پیشەسازی ڕۆژئاوا و پێداویستی پتر

بەنەوتی خاولە جیهاندا و پەیدا بوونی بازاری نوێ)[197] و بەرەوپێشچوونی تەکنیکی کاری بەرهەمهێنان لە(٩٦) ملیۆن تەنەوە بۆ(٤١٦)ملیۆن تەن هەڵکشا، بەڵام لە ساڵی ١٩٣٩ وە بەهۆی هەڵگیرسانی ئاگری جەنگی دووەمی جیهانییەوە بری بەرهەمهێنانی بۆ (٣,٨١٪) ملیۆن تەن داکشا و لە ساڵی ١٩٤١ دا بەهۆی بزووتنەوەی رەشید عالی گەیلانییەوە دوو هێندەی دیکە هاتە خوارەوە، و گەیشتە (٣٨. ١) ملیۆن تەن، بەڵام پاش ئەوە بەرەبەرە رووی لە هەڵشکان کردووە، تاکو ساڵی ١٩٤٥ بری بەرهەمەکەی چووە دۆخی جارانی پێش جەنگ و گەیشتە (٤,٣٤)ملیۆن تەن. هەڵکشانی بەرهەمی نەوتی کەرکوك تا ساڵی (١٩٤٧) بەردەوامیی هەبوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٤٨ دا بەهۆی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل و داخستنی لوولەی نەوت گواستنەوەی (کەرکوك – حەیفا) بری بەرهەمی نەوتەکەی لە(٤,٤٠)ملیۆن تەنی ساڵی ١٩٤٧ەوە بۆ (٣,١٠) ملیۆن تەن لە ساڵی ١٩٤٨ دادەبەزی.[198] ئەم هەڵبەز و دابەزی بەرهەمهێنانی نەوت رۆژانە بووە وێنەی ئەو دیاردەیە لە پێنج ساڵی یەکەمدا، ساڵ لەدوای ساڵ پتر دەبوو، کەچی لە ساڵی شەشەم هەتا دەیەم کەمی کرد. دواتر نەوەك هەرهاتە دۆخی جارانی، بەڵکە سێ ئەوەندە لەهی ساڵی یەکەمی تێپەڕاند، هۆکارەکانی بۆ: "کەمبوونی کاروانی تانکەر لەنێوان بەندەرەکانی نەوتی لەسەر کەناری رۆژهەڵاتی دەریای نێوەند (تەرابلس–حەیفا–لازقیە) و کەنداوی (ئابادان–خەرك) دەگەڕایەوە، لەبەر نەبوونی پێخەی ڕێگەی دەریایی، لە ئەنجامی جەنگی جیهانی یەکەم، بازاڕی نەوت لە ئەورووپادا، شەڕو هەڵای نێوخۆی کوردستان و وڵاتانی دەورووبەری، نابووتبوونی ئابووری وڵاتە پیشەسازییەکانی رۆژئاوا و... تاد..".[199] هاوکات(IPC) رۆڵێکی باڵای لە دواخستنی ئابووری عێراق و پشتگوێخستنی کەرتی کشتوکاڵی و پیشەسازیی گێڕاوە، چونکە هەرچی داهاتی ئەو نەوتە هەبوو دەچووە گیرفانی کۆمپانیا بیانییەکانەوە و بەشێکی کەمیش بە عێراق دەدرا و ئەویش هیچی بۆ ناوچەکانی باشووری کوردستان و کەرکوك بەتایبەت خەرج نەدەکرد، (IPC)هیچ کاتێك باسی قازانج و دەسکەوتە زۆرەکانی خۆیان نەدەکرد و راستییەکانیان دەشاردەوە.[200] بەو جۆرە(IPC) لە بەرهەمهێنان و فرۆشتنی نەوتی عێراق بەگشتی و کەرکوك بەتایبەتی تا ساڵی ١٩٥٠بەردەوام بوو، بەبێ ئەوەی هیچ هەوڵێك لەلایەن عێراقییەکانەوە بەمەبەستی خۆماڵیکردنی نەوت بدرێت.

بەڵام لە ساڵی ١٩٥١ دا، بەهۆی رازینەبوون لە دامەزراوەکانی (IPC)و کردارەکانی لە عێراقدا و کەمی پشکی وڵات لە بەرهەمە نەوتییەکانداو، هەروەها ئاسوودە نەبوونی عێراقییەکان بەوەی کە ئەو کۆمپانیایانە بەردەوام جەختیان لە نرخدانان بۆپشکی عێراقییەکان لەسەر نرخی گواستنەوەی فەرمی باو لە بازاڕەکاندا دەکردەوەو ئەوەش خۆی لە خۆیدا لەچاونرخی ئیستەرلینی نرخێکی نزم بوو، دواتر عێراقییەکان لە شاردنەوەی مافی رەوای خۆیان لەسەر رێچکەی کۆمپانیا لەبەرێوەبردن و بەکارهێنانی فەرمانبەرانی کارگێڕیی و هونەرییەکان رازی نەبوون، کە هیچ بەشدارییەکی عێراقییەکانی تێیدانەبوو.[201] لەلایەکی دیکەشەوە لە ساڵی ١٩٥١ دا، کە (دکتۆر موسەددەق)[202] بووە سەرۆکوەزیرانی ئێران، پرۆسەیەکی بێوێنەی لەناوچەکە ئەنجامدا و نەوتی ئێرانی خوماڵیکرد، هەرچەندە پرۆسەکە سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا، بەڵام هۆشیارییەکی گەورەی خستەوە و پریشکی گەیشتە گەلانی ناوچەکە، بەعێراقیشەوە.[203]

لە ساڵی ١٩٥١ دا هەندێك لەپارتە سیاسیەکانی عێراق داوای خۆماڵیکردنی نەوتیان لە عێراق کرد[204]و، دروشمی خۆماڵیکردنی سامانی نیشتمانیان بەرزکردەوە.[205] تەنانەت (پارتی دیموکراتی کورد)یش خۆماڵیکردنی نەوتی کردەئامانجی سەرەکی و لەپرۆگرامی خەباتیشدا بووە هۆی داهێنانی ووشیارییەکی گەورەی جەماوەری، بۆداواکارییەکانیان.[206]راستییەکەی ئەوەی کە پشتگیری ئەو پارتە عێراقییانەی دەکرد لەو پێشنیارانەدا، رای گشتی عێراقی و جەماوەری هۆشیاربوون، کە خۆی لەو نووسینانەدا دەبینییەوە کە لە رۆژنامە و گۆڤارە نێوخۆییەکاندا بڵاودەکرانەوە و لەو خۆپیشاندانانەی کە لە شارە گەورەکانی عێراقدا دەکران بەشێوەیەکی گشتیی و بەتایبەتی لە بەغداد و کەرکوکدا. ئەو پارتە ئۆپۆزسیۆنانە لەپێشیانەوە (حیزبی ئیستقلال) بەرێککەوتنامە نەوتییەکان نارازی بوون و(نووری سەعید)[207]یان تۆمەتبار دەکرد بەوەی کە ماف و بەرژەوەندیی گەل بەفیڕۆ دەدات، زۆرێك لە خەڵکی داوای خۆماڵیکردنی پیشەسازی نەوتیان دەکرد.[208] ئەمە لە (٢٥ی ئاداری ساڵی١٩٥١)دا چەند ئەندام پەرلەمانێکی عێراق لە یاداشتێکدا باسیان لە خراپی باری ئابووری وڵات کردو جەختیانکرد، کە کردەی ئەو نەوتەی عێراق هیواکانی لەسەر هەڵچنیوە هیچ سوودێکی لێ نابینرێت، نووسیبووشیان خۆماڵیکردنی نەوت مافێکی سروشتیی نەتەوەکانە و لە (٢٦ی نیسانی ساڵی١٩٥١)یشدا (محەمەد مەهدی کوبە)ی سەرۆکی (حیزبی ئیستقلال) لەبەرامبەر پەرلەماندا داوای خۆماڵیکردنی نەوتی کردووە. ئەمانەو چەندین هەوڵی تر لەلایەن حیزب و کەسایەتی و رێکخراوەکانی ئەوکاتەوە لەپەرلەمانی عێراقدادرا، بەڵام زەمینە و زەمانی هیچ کامیان بۆ سەرکەوتنیان لەبارنەبوو.[209] (نووری سەعید)یش لەبری جێبەجێکردنی ئەو داوایانەی گەلی عێراق، کەوتە چارەسەرکردن و گەڕاندنەوەی ئەو زیانانەی کە ئینگلیزەکان لێیان کەوتبوو، بەواژۆکردنی رێککەوتنامەیەکی تایبەت، کە رێژەی دەرهێنانی نەوت لە عێراق زیاد بکرێت بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو نەوتەی، کە ئینگلیزەکان لە ئێران لە دەستیان دابوو.[210] بۆیە پەرەسەندنی بەرهەمهێنانی نەوت، لەنێوان ساڵانی (١٩٥١–١٩٥٢)دابە گرنگترین ماوە لە گەشەسەندنی کۆمپانیاکان و پێوەندییان بە حکومەتی عێراقەوە دادەنرێت، لە ساڵی ١٩٥١ دا کۆمپانیای نەوتی عێراق–بەریتانی و کۆمپانیاکانی دیکە، کە لەگەڵیدا کاریاندەکرد دەستیان کرد بەکردارەکانی پەرەپێدان و دریژەدان بەبەرهەمهێنان و هەروەها رێژەی هەڵکەندنی چاڵی نەوت، ژمارەی پێوانەیی نوێی تۆمارکرد. لەوانەش گرنگتر ئەوەبوو کە بەفراوانبوونی بازاڕەکانی فرۆشتنی

نەوتی خاوی عێراق بەرهەمی خۆی بەدەستەوە نەدا تا ساڵی ١٩٥٢. هێڵی بۆریە نوێیەكان لە وڵاتی عێراقدا سێ بورسە بوو كە لە كەركوكەوە درێژ دەبووەوە تا كۆتایی هێڵە كە لە (بانیاس) لەسەر دەریای سپیی نێوەڕاست، ئەمەش بووە، هۆی ئەوە كە چەندین بەرهەمی نوی بێنێتە كایەوە و ڕێژەی نەوتی عێراق زیاد بكات، كە دەگەیشتە كەنارەكانی دەریایی سپی نێوەڕاست بەڕێژەی(١٥) ملیۆن لیتر، هاوكات تواناكانی بەرهەمهێنان لە كەركوك فراوان بوو تا بتوانێت بەرگەی ئەو زیادەیە لە بەرهەمدا بگرێت و بەرهەمی كێڵگەی كەركوك لە ماوەی ساڵی ١٩٥١ دا ژمارەی پێوانەیی شكاند و گەیشتە(٧٨٩٠٠٠)تەن.[٢١١] لەكۆتایی ساڵی ١٩٥٥ دا(٤٤) چاڵە نەوت لە كێڵگە نەوتییەكانی كەركوك خرانە كارو هەر لەو ساڵەدا(٢٥)ملیۆن تەنی لێدەرهێنرا.[٢١٢] هەموو ئەوانەش لە بەرژەوەندی وڵاتانی بیانیی بەشداری (IPC)دابوو، نەك دانیشتووانی شاری كەركوك.

پاش شۆڕشی ١٤ ی گەلاوێژی ١٩٥٨ و دامەزراندنی كۆماری عێراق، بابەتی سیستەمی جیاوكی نەوتی كە بەخشرابووە كۆمپانیا بیانییەكانی، كاریان لە عێراقدا دەكرد و قۆرخكاری تایبەت بە پرۆسەی بەرهەمهێنان بوون، لە گرنگترین ئەو كێشانە بوون كە ڕووبەڕووی حكومەتی كۆماری ببوونەوە و پێویست بوو زۆر گرنگیان پێبدات و بیانخاتە ژێر چاودێری خۆیەوە، كە ئەویش مافەكانی وڵاتە لە خاوندارێیەتی زەوییەكانیدا و بەرژەوەندییەكان و ڕێژەی سوود(قازانج)كە ئەو كۆمپانیایانە دەیاندایە حكومەتی عێراق. بۆیە لە كۆتاییەكانی ساڵی ١٩٥٨ دا حكومەتی نوێی عێراق ئەو بابەتانەی لەگەڵ كۆمپانیا نەوتییەكانی بەریتانیا كە لە عێراق كاریان دەكرد باسكردو داوای لێكردن كە پێویستە چاو بەسەرجەم جیاوكە تایبەتییەكانیاندا بخشێنەوە، دەستبكەن بە لابردن و گۆڕانكاری ئەو خاڵە نادیارانەی كە جیاوكەكانیان لەسەر بنیادنرابوو ئەمەش بەمەبەستی دووبارە گێڕانەوەی مافە ڕاواكانی عێراق، لەگەڵ ئەوەشدا چەند داواكارییەكی تریان خستە بەردەمی (IPC)[٢١٣] بەڵام لە دانووستانی سێ ساڵەی (١٩٥٨-١٩٦١)ی حكومەتی كۆماری عێراق لەگەڵ (IPC)شكستی هێناو[٢١٤]، نەگەیشتە ڕادەی خۆماڵیكردنی تەواوی ئەو كەرتە گرنگەی ئابووری لە عێراقدا.

دوای سەرنەكەوتنی دانووستانەكان، سەرانی شۆڕش باوەڕیان وابوو، دەبێت بەشێوەیەكی تر ئابووری عێراق لە پاشكۆیەتی بەریتانیا ئازادبكرێت.[٢١٥] سەرەنجام ڕێرەوێكی توندی گرتەبەر و[٢١٦] لە ڕۆژی (١١ی كانوونی یەكەمی ساڵی ١٩٦١)دا حكومەتی عێراق یاسای ژمارە(٨٠)[٢١٧] ی تایبەت بەدیاریكردنی ناوچەكانی وەبەرهەمهێنانی كۆمپانیا بیانییە كاركردووەكانی عێراقی دەركرد، بەپێی ئەو یاسایەش نزیكەی لە(٩٥٪)ی سەرجەم ڕووبەری ئەو زەوییانەی لەژێر كۆنترۆڵی كۆمپانیا بیانییەكاندا بوون چۆڵكردن و مافی جیاوكی لە خاكە وەبەرهێنەكاندا بۆخۆی هێشتەوە. دیسان هەموو ئەو زەوییانەشی دەرهێنا كە لەو كاتەدا سەر بە كۆمپانیا وەبەرهێنەكان نەبوون. ئەوجا ئەگەر بەشێك بوویێت لە چاڵگە وەبەرهێنەكان یان كێڵگەی دۆزراوە بووبن، یاخود ئەو زەوییانەی بوونی نەوتیان تێیدا سەلمێندراوە.[٢١٨] هەر بەپێی یاسای ژمارە (٨٠) كۆمپانیای نەوتی نیشتیمانی (شركة النفط الوطنية) دامەزراو، كە لەلایەن وەزارەتی نەوتی عێراقەوە بەڕێوەدەبرا و مافی دەرهێنانی نەوتی هەبوو جگە لە ناوچە سنووردارەكان.[٢١٩] سەبارەت بەو بارودۆخەو دەرچوونی یاسای ژمارە(٨٠) و دامەزراندنی كۆمپانیای نەوتی نیشتمانی، لە بەڵگە نامەی ژمارە(٩٤١١-CA)ئەمریكا لە ٢ی ئاداری ساڵی ١٩٦٣ ی دا، هاتووە:" نەوت: IPC بەم ئاكامە گەیشت، كە لەبەر ئەوەی ناتوانێت مامەڵەیەكی لەگەڵ قاسمدا بكات. لەكاتێكدا كە حكومەتی نوێی عێراق حكومەتێكی لاواز نییە، بەڵام بەڵگەكان وانیشاندەدن كە دەیەوێت لەگەڵ IPC لەسەر بابەتە گرنگەكان ڕێكبكەوێت. ئێستا وەزیرێكی لێهاتوو ژێر بووە بە وەزیری نەوت و دەستپێشخەریی بۆ دەستپێكردنەوەی وتووێژ لەگەڵ IPC كردووە و ئێمە چاوەڕوانی ئەوە دەكەین كە ئەم وتووێژە ببێتەهۆی گفتوگۆكردن لەسەر كۆمەڵێك بابەتی دیكە. لەمیانەی ئەم وتووێژەدا ڕوونتر دەبێتەوە چۆن حكومەتی عێراق دەیەوێت یاسای (٨٠) جێبەجێبكات و (كۆمپانیای نیشتیمانیی نەوتی عێراقی) چ ڕۆڵێك دەبینێت".[٢٢٠] لێرەدا ئەو ڕاستییە بەرجەستە دەبێت، كە یاسای ژمارە(٨٠)ی ساڵی ١٩٦١ كاریگەریی زۆر كردووەتە سەر وڵاتانی بەشدار لە (IPC)دا، بەتایبەتی دوای دامەزراندنی (كۆمپانیای نەوتی نیشتمانی)، لەلایەن حكومەتی عێراقەوە مەترسییەكان پتر كردووە، وای لێكردوون بەوردی سەیری هەنگاوەكانی حكومەتی عێراقی بكەن، چونكە هەر كارێكی خراپ دژ بە(IPC) بێت دژ بە بەرژەوەندییەكانی ئەوانە لە عێراقدا.

بۆجێگیركردنی سیاسەتی نەوتی عێراق و بەدەستهێنانی ئامانجی یاسای ژمارە(٨٠)ی ساڵی ١٩٦١، حكومەتی عێراقی بەپێی یاسای ژمارە(٩٧) ی ساڵی ١٩٦٧ كۆمپانیا نەوتییە نیشتمانییەكانی عێراق، تەواوی مافەكانی بەرهەمهێنانی نەوت و ماددە هایدرۆكاربۆنییەكان لە سەرجەم زەوییەكانی عێراق، كە لە دەرەوەی سنووری یاسای ژمارە(٨٠)دا بوون، بەخشییە ئەم كۆمپانیانە، لەنێوانیاندا ئاوە هەرێمییەكان و بنكە كەنار كیشوەرییەكانیش هەبوو.[٢٢١] ئەمەش دەقەكەیەتی:" لەسەرجەم خاكی عێراقدا، بەئاوی ناوچە ووشكانی و بەرژەوەندییەكانی دیكەی عێراق لە ناوچە بێلایەنەكەیشەوە، مافی وەبەرهێنانی نەوت و كەرەستە هایدرۆكاربۆنییەكان بە كۆمپانیای نیشتمانی نەوت دەدرێت و تایبەتە بەو كۆمپانیایانە..."[٢٢٢]....بەگوێرەی دەركردنی ئەو یاسایانە حكومەتی عێراق لە ساڵانی شەستەكاندا، هەنگاوێكی باشی نا بۆ خێراكردنی كاری بەنێوخۆماڵیكردنی نەوتن لە ساڵانی حەفتاكاندا.

لەگەڵ ئەوەی حكومەتی عێراق لە ساڵانی شەستەكاندا هەنگاو و پلانی بۆ خۆماڵیكردنی نەوت دادەنا، بەڵام لەدوای كودەتای ساڵی ١٩٦٣ وە بەعسییە كودەتاچییەكان دەستیان كرد بە لەسەركارلابردنی كۆمەڵێك زۆر لە كرێكارانی كورد

کە لە ساختمانەکانی کۆمپانیای نەوتدا کارییان دەکرد و گواستنیانەوە بۆ ساختمانەی تر لە دەرەوەی کەرکوك.[٢٢٣] ئەوەش تەنیا یەك راستی دەدات کە ئەوەیە حکومەتی عێراق نەیوست کۆمپانیای نەوتی کەرکوك، لە دەستی بێگانە دەربکات بیخاتە ژێر دەستی عەرەبەوە نەك خۆماڵی بکات.

بارودۆخەکە بەو چەشنە مایەوە تا ئەو کاتەی لە گەلاوێژی ساڵی ١٩٦٨دا بەعسییەکان بۆ جاری دووەم گەیشتنەوە دەسەڵات. هەر لە یەکەمین ساتەوەختی دەسەڵات گرتنەدەستیانەوە هەڵپەی ئەوەیان بوو کۆنترۆڵی تەواوی نەوتی عێراق بەکەرکوکیشەوە، بکەن.[٢٢٤] لەبەر ئەوەی نەوت بوو بەیەکێك لە رەگەزە سەرەکییەکانی دیاریکردنی داهاتووی عێراق، چ لەرووی سیاسی و چ لە رووی ئابووری و دیپلۆماسییەوە، بەتایبەت ئەو کۆمپانیا نەوتییە قۆرخکارییانەی کە هێزو کاریگەریی دیارییان هەبوو لەسەرکردایەتییکردنی پلاندا لەو ماوەیەدا، دژی بەرژەوەندی خەڵکی عێراق بەگشتی و[٢٢٥] دوورخستنەوەی عێرا ق لە رۆژئاواو جیهانی دەرەوە بەتایبەتی.[٢٢٦] بۆیە حکومەتی عێراق ئامانجی ستراتیژیی خۆی دیاریکرد، کە بریتی بوو لە کارکردن بۆ بەدەستهێنان و رزگارکردنی سامانی نەوت لەژێر سایەو دەسەڵاتی بیانییەکاندا و خستنە ژێر سایەی نیشتمانییەوە لەسەرجەم رووکارەکانەوە. سەرەتای هەنگاونان بۆ خۆماڵیکردنی نەوت لە عێراق و کەرکوك، دەتوانرێت بۆ ئەو وتارەی (ئەحمەد حەسەن بەکر) بگێردرێتەوە، کە لەیادی دووەم ساڵ رۆژی شۆرشی ١٧ی تەمموزدا دای، کاتێك رووی کردە کۆمپانیانەوتییەکان ووتی:" ئێمە رایدەگەیەنین کە حکومەتی شۆرش پشت بەیەزدان درێغی ناکات لە هیچ هەوڵێك لەپێناوی وەدەستهێنانی مافەکانی عێراقداو هەرگیز بە هیچ درێژکردنەوە و پێچ و پەنایەکیش بە ئەو مافانە، رازی نابێت عێراق ناتوانێت ئەو مەرجە گرانانە پەسەند بکات و داواکارییەکانیش بێنێتە دی، کە چەندین کاتیان بەسەردا تێپەریوە، لەبەرامبەر ماف سروشتی خۆیدا لەبەرهەمهێنان و خواردنی ئەو بەرهەمەی.. هاوشێوەی ئەم بابەتە زیندووانە کە لە بەرژەوەندیی گەلماندایە، ناتوانین لەمە بەدوواوە بۆ رۆژگاری بەجێبهێڵن، بەڵکو حکومەتی شۆرش پێداگرە لەسەر ئەوەی کە چارەسەری بکات و سەرجەم ئەو هەنگاوانەش بگرێتە بەر کە بۆ دابینکردنی مافە دروستەکانمان بەگونجاوی دەبینێت".[٢٢٧] ئەو وتارەی سەرۆککۆماری عێراقی ئەوکات، هەرەشەو ئاگادارکردنەوەیەکی توند بوو بۆ (IPC)، بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ بانگەشەی کاری بەنێو خۆماڵیکردنی نەوتی لە عێراق بەگشتی و لەشاری کەرکوکدا بەتایبەتی کرد. هەرلەپاش ئەوەش ئەو کۆمپانیایانە هیچ گرنگیان بەو وتانەی (ئەلبەکر)نەدەدا و لەسەر کردارەکانی خۆیان بەردەوامبوون. زیانێکی زۆریان بەئابووری عێراق گەیاند و سەرجەمی ئەو زیانە مادییانەی کە لەئەنجامی سیاسەتی کۆمپانیا وەبەرهەمهێنەرەکانەوە لە ماوەی (١٩٦٢-١٩٧٠) کەوتەوە، لە (٥٥٠)ملیۆن دینارکەمتر نەبوو، سەرباری ئەوەش عێراق لە ئەستۆی ئەو کۆمپانیایانەدا بوو نزیکەی (١٠٠) ملیۆن دیکەی لەپارەی کۆبووەوەی، کە زیانیان لێکەوت.[٢٢٨] سەرباری ئەوانەش رووداوەکانی کەنداو و خۆماڵیکردنی نەوتی لیبیا لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧١ دا، کە لەژێر سایەی کۆمپانیاکانی بەریتانیا دابوو، کە(٢٣. ٧٥٪)ی پشکەکانی (IPC)ی هەبوو، هانی دەسەڵاتی عێراقیان دا بۆ ئەوەی چەند هەنگاوێکی ئەرێنی[٢٢٩]، بۆ خۆماڵیکردنی نەوت لە وڵاتەکەیدا بگرێتە بەر.

دەسەڵاتدارانی عێراق بۆ سەرکەوتنی پلانی خۆماڵیکردنی نەوت، وردبینانە لەسەر ئاستی دەرەوە و نێوخۆشدا کاریان دەکرد، چونکە چاك دەیانزانی کارێکی لەو چەشنە بەبێ پشتیوانییەکی نێودەوڵەتی و پشتگیریی نێوخۆ ئەستەمە و رۆشنایی نابینێت. لەسەر ئاستی دەرەوە بیرییان لەسوود وەرگرتن لە ململانی ی ئەوسای هەردوو بلۆکی رۆژهەڵات و رۆژئاوا کردەوە و یەکێتی سۆڤێت وڵاتانی سۆسیالیستیان بەباشترین پشتو پەنا زانی. لەرۆژی (٢١ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٩)دا رێککەوتنامەیەك لەنێوان کۆمپانیای نەوتی نیشتیمانیی عێراق و دەزگای (تتکنۆ ئکسپۆرت)ی سۆڤییەتیدا واژۆکراو[٢٣٠] بەپێی ئەو رێکەوتنە سۆڤێت پتر لەهەزار راوێژکار و پسپۆری تەکنۆلۆجیا و سەربازی پێویست بە عێراق دەدات[٢٣١]، لەگەڵ قەرزێك بەبری (٢٥) ملیۆن دینار بەمەبەستی کرینی پێداویستییەکانی کۆمپانیاکە ولە ٤ی گەلاوێژی ئەوساڵەدا سوڤییەت بەپێی رێککەوتنێکی تر، بری(٢٤) ملیۆن دیناری وەك قەرز بە عێراقدا.[٢٣٢] بۆ پتر نزیکبوونەوە و راکێشانی دەستی هاوکاریی سۆڤییەت بۆ عێراق، لە ئابی ساڵی ١٩٧٠ دا(سەددام حوسێن)ی جێگری سەرۆککۆماری ئەوکاتیی عێراق بەسەردانێکی فەرمی چووە یەکێتی سۆڤییەت، دووابەدوای ئەوە رۆژ لە دووا رۆژ پێوەندییەکانی نێوان عێراق و سۆڤێت بەهێزتر دەبوو.[٢٣٣]

لەلایەکی ترەوە حکومەتی عێراق، لە کۆتایی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧١ دا لە نزیکەوە دەستیکرد بە دانووستان لەگەڵ (IPC)دا بەمەبەستی چارەسەکردنی کێشەو جیاوازییەکانیان کردو لە ١٣ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٢دا رادیۆی بەغداد لە روونکردنەوەیەکدا بۆ گوێگرەکانی، جەختی کرد کە تەواوی مافەکانی گەلی عێراق لە کۆمپانیاکانی نەوت دەسەندرێنەوە و هیچ سازشێك لەسەر جیاوکەکانی ناکرێت کە زیان بەبەرژەوەندیی گەل بگەیەنێت، بەڵام ئەو دانووستانانە هیچ پێشکەوتنێکی سەرەتاییشیان بەدەستنەهێناو بۆ ماوەی هەفتەیەك دواخران، لەوکاتەدا (سەددام حوسێن) بەسەردانێکی فەرمی لەگەڵ شاندێکی باڵای حکومەت، بۆ بانگەشەکردن بۆ رێککەوتنامەیەکی ستراتیژی لەگەڵ یەکێتی سۆڤییەت چووە مۆسکۆ.[٢٣٤] ئەو هەوڵەی حکومەتی عێراق دوو مەبەستی لە پشتەو بوو، کە یەکەمیان بۆ فشارخستنە سەر(IPC) و رازیبون بەداواکارییەکانی عێراق بووو دووەمیان بۆ ئەوەی ئەو رێککەوتنە بکاتە بناغەیەکی تەواو بۆ کاری بەنێو خۆماڵیکردنی نەوت لە عێراقدا.

سەرەنجام، لە درێژەی پێوەندییەکانی عێراق ویەکێتی سۆڤییەت لە ٧ ی نیسانی ١٩٧٢ دا شاندێکی سۆڤێتی

بەسەرۆکاتی (ئەلیکسی کۆسیگین)ی سەرۆکوەزیرانی ئەوکاتەی سۆڤێت، گەیشتە بەغداد.[٢٣٥] دوواجار لە ٩ نیسانی ئەو ساڵەدا، عێراق و سۆڤێت پەیمانی دۆستایەتی[٢٣٦] و هاوکارییان بۆ ماوەی (١٥) ساڵ واژۆکرد.[٢٣٧] کە تایبەت بوو بەهەردوو بواری ئابووری و سەربازی سۆڤییەتییەکان مەبەستیان بوو لەو ڕێگەیەوە جێپێی خۆیان لە کەنداوی عەرەب قایم بکەن بەتایبەت پاش ڕێگەدان بە کەشتی گەلی سۆڤێت و هاموشۆکردن و پەرە بە جموجوولی ئابووریی خۆیان بدەن، سوود لە کانە نەوتییەکانی عێراق وەربگرن و وەك چەکێکیش عێراق دژی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا بەکاربیهێنن.[٢٣٨] هاوکات ئەو پەیمانە بۆ عێراقیش زۆر گرنگ بوو، چونکە پاڵپشتیی سۆڤێت هەنگاوی یەکەم بوو بۆ پاراستنی عێراق لەکاتییکاری خۆماڵیکردنی نەوەتدا[٢٣٩]. کەواتە پەیماننامەی (عێراق و سۆڤێت) بۆ بەرژەوەندییەکانی هەردوولایان لە بواری ئابووری بەگشتی و پترۆلیدا بەتایبەتی گرنگ بوو.

هەر لەسەر ئاستی بەهێزکردنی پێگەی دەوڵەتی عێراق لەدەرەوە، لە ڕۆژی ٢١ی تشرینی یەکەمی ساڵی١٩٦٩دا کۆمپانیای نەوتی نیشتیمانیی عێراق ڕێککەوتنامەیەك لەگەڵ دەزگایەکی هەنگاری بۆ هەڵکەندنی ٤ بیری نەوت بەست، هەر لەو ساڵەدا پێوەندیی لەگەڵ کۆریای باکوور دروستکردو شاندێکیان سەردانی عێراقیان کرد.[٢٤٠] بەو جۆرە دەسەڵاتدارنی عێراق زەمینەی نێودەوڵەتیی کاری خۆماڵیکردنی نەوتیان لە عێراق خۆشکرد و توانییان پشتیوانییەکی بەهێز بۆ کارەکەیان پەیدا بکەن.. لەسەر ئاستی نێوخۆش پاش ڕاگەیاندنی بەڵێننامەی کارکردنی نیشتیمانی پشتگیرییەکی زۆر بۆ کاری خۆماڵیکردنی نەوت، لەسەر ئاستی جەماوەر و ڕێکخراو و پارتە عێراقییەکان هەبوو، وەك (حیزبی شیوعیی عێراق)[٢٤١] کە لەگەڵ حیزبی بەعسدا چووە نێو (بەرەی پێشکەوتخوازی نیشتیمانی)یەوە و زۆر بەتوندی بانگەشەی بۆ کاری بەنێو خۆماڵیکردنی نەوتی عێراق دەکرد.

دەسەڵاتدارانی عێراق دڵنیابوون لەوەی کە لە دانووستاندنەکانیاندا لەگەڵ (IPC)دا ناگەنە هیچ ڕێککەوتنێك، بۆیە لە ڕۆژی ١٨ ی ئایاری ساڵی ١٩٧٢دا حکومەتی عێراق ئاگادارکردنەوەیەکی کۆتایی دایە (IPC) و ڕای گشتیی عەرەبی و جیهانیش، کە تێیدا هاتبوو:

یەکەم: وەڵامدانەوەیەکی خێرا بۆ داواکاریی حکومەت لە بەرزکردنەوەی ڕێژەی بەرهەمهێنان بۆ پلەیەکی بەرز لە بۆرییە نەوتییەکاندا، بەپێچەوانەوە هەڵوێستیان دەبێت.

دووەم: پێویستە بەو ڕێککەوتنانە پابەندبن، کە لەگەڵ وەزارەتی (نەوت و کانزاکان) دا بەستراوە بۆ دانانی ڕێچکەیەکی بەرهەمهێنانی جێگیر و درێژخایەن، بەپێی بنەمایەکی زانستی لە کێڵگە نەوتییەکاندا و سەرەتای نییەتێکی باشیان بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجە بەدەربخەن.

سێیەم: پێویستە وێنایەکی باش بەدەستەوە بدەن لەبارەی ئەو داواکارییانەی کە نوێنەرانی دانووستانکارانی حکومەت، لە چوارچێوەی دانووستانەکانی کۆتاییدا پێشکەشیان کردووە.. عێراق ڕێگە بە کۆمپانیاکان دەدات تا بتوانن چاو بەو ئاگادارکردنەوەیەدا بخشێنێتەوە، بۆ ماوەیەك کە لە دوو هەفتە پتر نەبێت، پاش مێژووی بڵاوکردنەوەی ئەو بەیانە. بە پێچەوانەشەوە حکومەتی عێراقی ناچار دەبێت، لەگرتنەبەری سەرجەم ڕێوشوێنە یاساییەکان بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی نیشتیمانی و مافە ڕەواکانی گەلەکەی و لەگەڵ ئەوەشدا داوای لە هاووڵاتییانی عێراق کرد بۆ بەگژداچوونەوەی کۆمپانیا قۆرخکارییەکان لە عێراقدا.[٢٤٢]

حکومەتی بەعسییەکان زۆر بە وریاییەوە کارەکانیان جێبەجێ دەکرد، دەیانزانی کارێکی وەها پێویستی بە بەرەیەکی نێوخۆیی توندوتۆڵ هەیە، بۆ ئەو مەبەستەش لە١٤ی ئایاری ئەو ساڵەدا (حیزبی بەعس) خۆی لە هەردوو حیزبی شیوعی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان پتر نزیك خستەوەو بۆ یەکەمجار دوو ئەندامی حیزبی شیوعیی کرد بە وەزیر کە ئەوانیش (عامر عەبدوڵلا و موکەرەم تاڵەبانی) بوون،[٢٤٣] بەڵام سەرکردایەتیی پارتی دیموکراتی کوردستان لەو کاتەدا خۆی لە حکومەتی بەعس بەدوور گرت، لەبەرئەوەی کاتێك سەرکردایەتیی کورد سووربوو لەسەر ئەوەی کە کەرکوکی دەوڵەمەندبەنەوت بخرێتە ناوچەی حوکمی زاتییەوە، حکومەتی بەعس بەوە ڕازی نەبوو.[٢٤٤] هەر لەبەر ئەوەش سەرکردایەتیی پارتی بەپراکتیکی نەچووە نێو کاری بەنێو خۆماڵیکردنی نەوتی عێراق بەگشتی و کەرکوك بەتایبەتی.

پاش کۆتایهاتنی ئاگادارکردنەوەی حکومەتی عێراق، لە ڕۆژی ٣١ ی ئازاری ١٩٧٢دا شاندێکی (IPC) چوونە بەغداد وتوویژی نوێ کراو لەو کۆبوونەوەیەدا ئەندامانی شاندی (IPC) خۆیان لە یاسای ژمارە(٨٠) دەدزیەوە، بەڵام لایەنی عێراقی سەرجەم داواکارییەکانی ئەوانیان ڕەتکردەوە و سەرەنجام پێك نەهاتن. لەو بارەیەوە (مورتەزا سەعید عەبدولباقی) ئەندامی شاندی عێراقی بە(ئاژانسی دەنگوباسی عێراق)ی، وتووە:" لەو کاتەدا کە ئاگادارکردنەوەکەی ئەنجوومەن دیاریکرد بوو، نوێنەرانی کۆمپانیا نەوتییەکان ئامادەبوون و شتێکی نوێیان پێشکەش کرد. کاتێك گوێمان لەنێوەرۆکی ئەو بابەتەگرت، بینیمان لەنێوەرۆکدا هیچ جیاوازییەکی لە شتەکانی پێشوویانییە، بۆیە کۆمپانیاکانمان هەروەك چەندین جار تێگەیاندەوە لەم دانیشتنەدا کە ئێمە بەتەواوی ڕەتی دەکەینەوە و بەهیچ جۆرێك لە جۆرەکان پەسەندی ناکەین، کە گفتوگۆی بابەتی قەرەبووکردنەوەی کۆمپانیاکان بکەین... بە کۆمپانیاکانمان ڕاگەیاند، کە کاتژمێر ١١ی بەیانیی ڕۆژی داهاتوو، کاتیی کۆتاییە کە پێشنیارێکمان پێشکەش بکەن، کە وەڵامدەرەوەی داواکارییە ڕەوا و ڕوونەکان بێت، ئەگەر ئەو کۆمپانیایانە لە کاتژمێر ١١ ی بەیانیدا پێشنیارێك (عەرزێکی)ی نوێ پێشکەش نەکەن، ئەوا واتای کۆتایی وتوویژەکانە".[٢٤٥] پاش وەڵامنەدانەوەی (IPC) وپێداگری لەسەر هەڵوێستەکانی، ئەوکات حکومەتی عێراق بڕیاریدا کاری بەنێو خۆماڵیکردنی نەوت بکاتە بواری جێبەجێکردنەوە.

دوای سەرنەکەوتنی گفتوگۆکان، لە ڕۆژی ١ ی

حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٢دابڕیاری خۆماڵیکردنی نەوتی عێراق دەرچوو[٢٤٦] و هەرئەوڕۆژە یاسای ژمارە (٦٩)[٢٤٧] ساڵی ١٩٧٢ بڵاوکرایەوە، کەسەرەتای بنیادنانی کۆمپانیایەکی حکومیی بەناوی (کۆمپانیای عێراق بۆ کاروباری نەوتییەکان I. C. O. O-)دیاریکردبوو، کەئەو کۆمپانیایە ڕاستەوخۆ بە جێبەجێکردنی بڕیاری خۆماڵیکردنی نەوت و سەرپەرشتیکردنی کارگێڕیی کۆمپانیانەوتییەکان لە عێراقدا هەڵدەستێ.[٢٤٨] ئەوکات توانی دەست بەسەر ٦٥٪ ی بەرهەمی نەوتی عێراقدا بگرێت. لە١ی مارسی ساڵی ١٩٧٣ دا (IPC) بەو بڕیارەی عێراق ڕازی بوو. کە جەنگی (ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٣)ش لەنێوان عەرەب وئیسرایل هەڵگیرسا، دەسەڵاتدارنی عێراق بەچەند بڕیارێك[٢٤٨] بەشەکانی (ئەمریکا و هۆڵەندا و کۆمەڵێك کۆمپانیای تر) کەمابوون خۆماڵیکرد.[٢٥٠] بۆوێنە بەپێی یاسای ژمارە(٢٨)ی ساڵی ١٩٧٣ لەیەکی حوزەیرانی ئەوساڵەدا ڕێککەوتنامەی نێوان کۆماری عێراق و کۆمپانیای نەوت واژۆکرا، کە کۆتایی بەجیاوکی کۆمپانیای مووسڵی سنووردار هێناو بە کۆتاییهاتنی ئەو جیاوکەش دەسەڵات و سەروەری عێراقی بەسەر تەواوی نەوتی باشووری کوردستاندا گەڕایەوە و دەسەڵاتی عەرەبی بووە تاکە لایەنی زاڵ لەسەر نەوتی باشووری کوردستان بەگشتی و کەرکوکدا بەتایبەتی.[٢٥١] دوای ئەوە ئاڵای عێراق لەسەر بارەگای کۆمپانیای نەوتی (مووسڵ) لە ١ ی نیسانی ساڵی ١٩٧٣ دا هەڵکرا، وەك سەرەتایەك بۆ کۆتاییهاتنی دەسەڵاتی بیانی بەسەریەوە و گەڕانەوەی خاوەندارییەتیی بۆ حکومەتی عێراق.[٢٥٢] دیارە ئەوەی ڕاستیبێتکاری بەنێو خۆماڵیکردنەی نەوتی باشووری کوردستان و کەرکوك خۆماڵیکردنێکی ڕاستەقینە نەبوو، بەڵکو تەنیا گۆڕانێك بوو لە داگیرکاریی بیانیی ئەوروپی و ئەمریکییەوە بۆ داگیرکارێکی نوێ، کە بەعسییە عەرەبەکان بوون. باشترین بەڵگەش بۆ ئەو ڕاستییە گۆڕینی ناوی کەرکوك بوو بۆ ناویکی عەرەبی کە(التأمیم) بوو لەو کاتدا.

بەم شێوەیە لەسەر دەستی ڕژێمی بەعس لە ساڵی ١٩٧٣ دا نەوتی کەرکوك کرابە (نەوتی بەعسی عەرەبی)[٢٥٣]، بەعس دروشمی(نەوتی عەرەب بۆ عەرەب)ی بەرزکردەوە و، ئەوەش نیازێکی پلان بۆداڕێژراوی بەعس بوو و بەشێك بوو لە سیاسەتی بەعەرەبکردن، کە لە کەرکوك و هەندێك ناوچەی باشووری کوردستاندا گرتبوویە بەر، گرێدانی ئەو دروشمەش بە نەوتی کەرکوکەوە بەلای جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان، دوورکەوتنەوەی ڕژێمی عێراق بوو لەو ڕاستییەی کە بەنێو بۆ کاری خۆماڵیکردنی نەوتی عێراق تێدەکۆشا.[٢٥٤] هەر ئەوەش وای لە(مستەفا بارزانی)کرد فشاری بخاتە سەر ڕژێمی عێراق، داوابکات بەدابەشبکرێت داهاتی نەوتی کەرکوك بەپێی ڕێژەی دانیشتووان، بەعسیش کە لە نیازی کورد بۆ داواکردنی کەرکوك بەئاگابوو، بەبیانووی ئەوەی کە تەنیا حکومەتی نیشتمانی (نێوەند) بڕیار لەسەر دابەشکردنی هەرسامانێکی نیشتمانیی وەك داهاتی نەوت دەدات، ملی بۆ ئەو داخوازییە نەدا.[٢٥٥] لەگەڵ ئەوەشدا دوای کاری بەنێو خۆماڵیکردنی نەوتی عێراق بەگشتی و بەعەرەبکردنی نەوتی کەرکوك بەتایبەتی، داهات و سەرمایەی نەوت ببووە هۆکارێك بۆ دژایەتیکردنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی باشووری کوردستان و بە عەرەبکردنی و بە بەعسیکردنی کەرکوك، کە لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا ڕووندەکرێنەوە:

یەکەم: نەوتی کەرکوك و پرۆژەی خزمەتگوزاری: نەوت یەکێکە لەو سامانە سروشتییانەی بایەخێکی ستراتیژیی لەژیانی خزمەتگوزاری گەلانی جیهاندا هەیە، نەوت لە خاکی هەر دەوڵەتێك یان گەلێکدا بێت چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرێت، کە ئاستی خزمەتگوزاریی ئەو وڵاتە یان نەتەوەیە بەرەو سەرببات و ڕۆڵی گرنگ لە پێشخستن و بەرەوپێشبردن وپەرەپێدانی وڵات ببینێت، ڕۆڵێکی گرنگیشی لە بەهێزکردنی ئەو وڵاتەدا هەبێت، بەشێوەیەکی ئەوتۆ نەیارانی نەتوانن بۆی ببنە مەترسی. هاوکات نەوت یەکێکە لەو سامانانەی دەبێتە جێی سەرنج و چاوتێبڕینی وڵاتان و گەلانی تر، کە هەمیشە هەوڵی لاوازکردن و پارچە پارچەکردنی ئەو نەتەوەیە دەدەن بۆ ئەوەی بتوانن بەئاسانی ئەو سامانە بەتاڵان بەرن. ئەگەر گەلانی دونیا ئاواتەخوازبن نەوتیان هەبێت بۆ ئەوەی وڵاتەکەیان بەرەو پێش بەرن و ئاستی خزمەتگوزاریی وڵاتیانی پێ بەرزربکەنەوە و ژیانێکی ئاسوودەو بەختیار بنیات بنێن، ئەوا لە باشووری کوردستان و لە کەرکوکدا بەپێچەوانەوەیە نەوت یەکێك بووە لەو هۆیانە و بگرە هۆکارێکی کاریگەریش بووە لەوەی کوردستان پارچەپارچە بکرێت و بەشێك لە کوردیش بە عێراقەوە بلکێندرێت و کەرکوکیش لە جێی خزمەتگوزاری بێبەشبێت و سیاسەتی (بەعەرەبکردن و ڕاگواستن و بەبەعسیکردن)ی تێیدا بخرێتە گەڕ.[٢٥٦] لەکاتێکدا کە حکومەتی عێراق نەخشەی بۆ ئاوەدانکردنەوەی عێراق لەداهاتی نەوتی کەرکوك کێشابوو، بەڵام نەخشەکە تەنیا بۆ عێراقی عەرەبی بوو و جۆرەها کارگەی لەشارەکانی خواروو نێوەڕاستی عێراق دروستکرد، گەر بەراورد بکرێت بەوانەی باکووری عێراق (باشووری کوردستان)ئەوا جیاوازی زۆریان هەبوو. لە هەرسێ پارێزگای (هەولێر و سلێمانی و دهۆك) ژمارەی کارگەکانیان لە پەنجەکانی دەست تێنەدەپەڕی و ئەوەی سەبارەت بە کەرکوکیشە لەڕووی خزمەتگوزاری و ئاوەدانییەوە لەشارەکانی تری (سلێمانی و هەولێر ودهۆك) زۆر خراپتر بوو، چونکە حکومەت هیچ کارێکی خزمەتگوزاری و بنەمای پێشکەوتنە شارستانییەکانی تێیدا ئەنجام نەدەدا، ئەمەش بەمەبەستی ئەوەی کوردەکانی ئەو شارە شارەکەی خۆیان بەجێبهێڵن.[٢٥٧] لەلایەکی ترەوە داهاتی نەوتی کەرکوك بۆ ڕاکێشان و دروستکردنی خانوو بۆ عەرەبە هاوردەکانی کەرکوك بەکاردەهێندرا.[٢٥٨]

دووەم: نەوتی کەرکوك و سیاسەتی جیاکاریی نەتەوەیی لە کۆمپانیای نەوتی باکووردا: لەدوای کاری بەنێو خۆماڵیکردنی نەوت لە شاری کەرکوك، جیاکاری نەتەوەیی لە دامەزراندنی فەرمانبەران لە بواری پیشەسازیی نەوت لەنێو هەموو نەتەوەکانی کەرکوك کرا، بەڵام کورد لە هەموویان پتر پەراوێزکراو پاکتاوی ڕەگەزیش لەنێو کۆمپانیای نەوتی

کەرکوکدا دەستی پێکرد.[٢٥٩] حکومەتی نێوەند دوابەدوای ئەو کارەی بەنێو خۆماڵیکردنی نەوت، دەستی بە دەرکردنی هەموو کرێکارو ئەندازیارو شارەزا کوردەکانی نێو کۆمپانیای نەوتی کەرکوک کرد یاخود ڕەوانەی خانەنشیکردنی کردن،[٢٦٠] بۆنموونە: لە ساڵی ١٩٧٣دا حکومەت بەجارێك (١١٨)کرێکاری[٢٦١] کوردی لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوک دەرکرد و لە جێگەی ئەوان کرێکاری ناشارەزای عەرەبی هێناو لە کەرکوك نیشتەجێکردن، جارێکی تر و هەر لەو ساڵەدا(٥٠٠) کرێکاری کورد گوێزرانەوە و لە ساڵی ١٩٧٤ یشدا (٥٦) کرێکاری تر لەوانەی لە پیشەسازیی نەوتدا کاریان دەکرد گوێزرانەوەو عەرەب لە جێگەیان دامەزرێنران.[٢٦٢] (مامۆستا بێستوون عەلی کەریم) وەك گەواهیدەرێك لەبارەی کاری خۆماڵیکردنی نەوتی کەرکوک و ڕەنگدانەوەی بەسەر کرێکارانی کۆمپانیای نەوت لە کەرکوك، دەڵێت:" دوای خۆماڵیکردنی نەوتی کەرکوك لە ساڵی ١٩٧٣، ئیدی سەرانی حکومەتی عێراقی بەشێوەکی فراوان دەستیان کرد بەدەرکردنی کرێکاران و کارمەندانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك، تەنیا بەیەك مەرج ڕێگەی مانەوەیان پێدەدان کە خۆیان بە عەرەب یان تورکمان[٢٦٣] لە قەڵەمبدەن، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٤ ەوە ئیدی بەتەواوی کەوتنە دەرکردنی هەموو کرێکارانی کوردی کۆمپانیاکەو بۆ ناوچەی بەنێوحوکمی زاتی یان خوارووو نێوەڕاستی عێراق دەیانگواستنەوە".[٢٦٤] (ئیسماعیل حەیدەر عەلی)یش، کە کرێکارێکی ڕاگوێزراوی ئەو کاتیی کەرکوکە، دەڵێت:" لە ساڵانی ١٩٧٣-١٩٧٤ دا کۆمەڵێك لیست لەلایەن حکومەتی بەعسی عێراقەوە دەرچوون، کە هەر یەکە لەو لیستانە نزیکەی دووسەد ناوی کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوکی تێیدا بوو، بەمەبەستی ڕاگوێزانیان بۆ ناوچەکانی تری عێراق ".[٢٦٥] لێرەدا دەردەکەوێت ڕژێمی بەعس بەشێوەیەکی پلان داڕێژراو پلە بەپلە هەموو ئەو کوردانەی، کە لە دەزگاکانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك و دەورووبەری کاریان دەکرد یان بۆ دامودەزگاکانی دی لە نێوەڕاست و خواروو باکووری عێراق گواستنییەوەو کارکەرانی عەرەبی لە شوێنیان دادەنا. لەلایەکی تریشەوە لەمپەری لەبەردەم دامەزراندنی کرێکارو فەرمانبەری کورددا دروستدەکرد و بەلێشاویش عەرەبی دادەمەزراند.

ڕۆژنامەی (التآخي) زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان، لەکاتێکی زوودا ئاماژەی بەو سیاسەتە ڕەگەزپەرستانەی بەعسکردووە، کەوا کۆمپانیای عێراق پاش خۆماڵیکردنی نەوتی کەرکوك دەستی بەو سیاسەتە دژی فەرمانبەر و کرێکارە کوردەکانکردووە، کە نووسیویەتی:" کۆمپانیاکە دامەزراندنەکەی چرکردبووەوە تەنیا بۆ برایانمان لە کرێکارەکانی عەرەب، کەوا لە دەرەوەی پارێزگای کەرکوك دەیهێنان، تاکو ئێستا (١٩٧٣) نزیکەی (٦٠٠) کرێکار کە زۆربەیان عەرەبن لە دەرەوەی پارێزگاکە هێنراون و بەکارخراون، لەگەڵ ئەوەشدا بەگوێرەی تۆماری کارکردن (١٣) هەزار بێ کار لە هاووڵاتیانی پارێزگاکە هەن ئەم سیاسەتە چەوتە، بووە هۆی دروستکردنی بێزاری بە تایبەتی لەم پرۆژەیەیی کەرکوکدا، سەرباری ئەوەش کە ئەو سیاسەتە ڕەگەز پەرستییە ڕووکەشە لەگەڵ یەکێتی نیشتیمانیی و برایەتی نەتەوەیی، چونکە پارێزگاکە بەدەست بێکاری و دوواکەوتنی کۆمەڵایەتی و کەمیی خزمەتگوزارییەوە دەناڵێنێت. ئەم سیاسەتە چەوتە دەبێتە هۆی جیابوونەوەیەکی نێوان هاووڵاتیانی عێراقی بەهۆی هەستی نەتەوەیی کە ناگونجێت لەگەڵ دەقی دەستوور و لەگەڵ بنەماکانی مرۆڤایەتیش، یەکێتی نیشتیمانی لاوازدەکات و بریاری خۆماڵیکردنیش دەشێوێنێت".[٢٦٦] ئەندازیارو داڕێژەری ئەو نەخشانەش بە ووتەی (سەرۆکی یەکێتی گشتیی کرێکارانی بەغداد) کە (محەمەد عایش) ە، سەددام حوسێنی جێگری سەرۆك کۆماری ئەوکاتیی عێراق بووە.[٢٦٧] کە دەیویست لەو ڕێگەیەوە پتر درێژە بەکاری بەعەرەبکردن لە کەرکوك بدات و ململانێی نەتەوەیی بخاتە نێوان نەتەوەی کوردو کەمە نەتەوەکانی دیکەی نێو شارەکەوە، وەك (عەرەب).

لەلایەکی ترەوە پاش کاری بەنێو خۆماڵیکردنی نەوت، ئەو بەڕێوەبەرانەی دادەمەزرێندران هەموویان عەرەبی بەعسی بوون وتواناو شارەزایی و لێهاتوویی، ڕۆڵی نەما، تەنیا پێوەر وابەستەیی و ملکەچی و بە بەعسبوون بوو، لەوانەش (غانم عبدولجەلیل، عەبدولستار ئەلداودی، ئیسماعیل ئەلنەجار و ماجد ئەلحەمدانی... تاد..)[٢٦٨] بەدانانی ئەو بەڕێوەبەرە عەرەبە بەعسییانە، وردە وردە دیاردەی گەندەڵی سەریهەڵدا و بەهەموو جۆرێك دزی دەستی پێکرد، ئەمەش بەحوکمی زۆری پارەی تەرخانکراو بۆ کارەکان و زۆریی کارەکان و دەستێوەردانی حیزبی بەعس بۆ نێو کۆمپانیا، بوو.[٢٦٩]

سێیەم: زیادکردنی بەرهەمهێنانی نەوتی کەرکوك دوای ساڵی ١٩٧٢:حکومەتی عێراق هەموو شێوازێکی تەکنیکیی نوێی تاقیکردەوە و لەو ڕووەوە ویستوویەتی ڕووتاندنەوەی سەروەت وسامانی باشووری کوردستان و کەرکوك بەتەنیا بۆخۆی بقۆزێتەوە. ئەو سیاسەتی فراوانخوازییە، دەسەڵاتدارانی عێراقی بۆ خۆماڵیکردنی نەوت لە(١ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٢دا هاندا، و دواتر دەرکردنی بریاری ژمارە(٦٩ی ساڵی ١٩٧٢) و یاسای ژمارە(٩٠ ی ساڵی ١٩٧٣).[٢٧٠] دەسترۆیشتوویی تەواوی عێراق بەسەر بەرهەمهێنانی نەوتی باشووری کوردستان و کەرکوك بەپێی ئەو یاسایانە، بە واتای بەستنەوەی بەرهەمهێنان بە ئابوورییەوە دێن و بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی عێراق ڕێچکە دەگرێت، دیسان بەو واتایەیش دێت، کە بەرهەمهێنان کاریگەریی لە شەڕەکانی عێراق و پێوەندییە دەرەکییەکانیدا دەبێت.[٢٧١] بۆ سەلماندنی ڕاستی ئەوەش ئاماژە بۆ ڕاپۆرتی سیاسی کۆنگرەی هەشتەمی سەرکردایەتیی هەرێمی (حیزبی بەعسی سۆسیالیست) دەکرێت کە لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٤ لە بەغداد بەسترا، ئاشکرای دەکات کە چۆن نەوت و داهاتی نەوت روو لە زیادبوونە لەماوەی ساڵانی (١٩٦٩-١٩٧٤) نزیکەی سێ قات بووجەی دەوڵەتی بەرزکردۆتەوە، هەرئەو ڕاپۆرتە ڕوونی کردووەتەوە کە بەرزبوونەوەی بوودجەی دەوڵەتی

عێراق، لەنێوان ساڵانی (١٩٧٢-١٩٧٤) دا لەبری (١٢١٨) ملیۆن دینارەوە زیادی کردووە بۆ (٢٥٥٠) ملیۆن دینار، کە نزیکەی (٧٠٪)ی ئەو داهاتەش هی نەوتی کەرکوکەو(٥٪) یش هی کانەکانی (عین زالە) و (خانەقین)ە، کە دەکاتە (٧٥٪) ی داهاتی نەوتی باشووری کوردستان.[٢٧٢]

ئامارە نەوتییەکانیش نیشانی دەدەن، کە بەرهەمی نەوتی ناوچەی کەرکوك لە ساڵی ١٩٧٣ دا لە(٥٦,٢)ملیۆن تۆن بۆ (٦٢) ملیۆن تۆن لە ساڵی ١٩٧٤ و ١٠٠ ملیۆن تۆن تاکۆتایی حەفتاکان بەرزبووەتەوە. [٢٧٣] کەداهاتەکەشی بەم جۆرە بووە، لە ساڵی ١٩٧٢ (٥٧٢) ملیۆن دۆلار، ساڵی ١٩٧٣ ئەو داهاتە هەڵکشا بۆ (١. ٤) بلیۆن دۆلار وساڵی ١٩٧٤ بۆ(٥. ٧) بلیۆن دۆلار بەرزبووووەوە.[٢٧٤] کەواتە داهاتی نەوتی باشووری کوردستان بەگشتی و کەرکوك بەتایبەتی وایکردووە کە ئابووری ڕژێمی بەعس بەرزبکاتەوە و ئەو زیادبوونەی داهاتیش لە ساڵانی حەفتاکاندا بۆ بەعس، پێویست بووە، چونکە لەلایەکەوە بەشێوازێکی ڕووکەشی لەگەڵ سەرکردایەتیی کوردا لە دانووستاندابوو، لەلایەکی دیکەشەوە لە هەوڵ و پلانداناندا بوو تاکو بتوانێت بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد هەرەس پێبهێنێت.

چوارەم: نەوتی کەرکوك بۆ خۆپڕچەککردن و شەڕ دژی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان: نەوتی کەرکوك بووە سەرمایەیەکی گرانبەها بۆ ڕژێمی بەعس کەدەیتوانی گەلێك وڵاتی پێبترسێنێت، سەرەڕای ئەوەی بەهۆیەوە پارەیەکی یەکجار زۆری بۆخەزێنەی خۆی و بۆ کڕینی باشترین و زۆرترین چەکی[٢٧٥] نوێ، کۆکردەوە هەروەها بەهۆی ناردنە دەرەوەی بەردەوامی نەوتەوە، حکومەت لەگەڵ وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤێت، پردێکی گەورەی پێوەندی لەگەڵ کاربەدەستانی ئەووڵاتانە دروستکرد، بەوشێوەیە لە عێراق دا نەوت هێندە گرنگیی پەیدا کرد، کەبووە یەکێك لەوهۆیە سەرکییانەی وای لەفەرمانرەوایانی بەعس کرد، خۆیان بۆ شەڕ دژی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان سازو ئامادە بکەن.[٢٧٦] شەڕی نێوان عێراق وشۆڕشی کورد لەنێوان ساڵانی ١٩٧٤- ١٩٧٥ دا، نزیکەی چوار بلیۆن دۆلاری تێچوو، بەئابووری عێراقی لاوازکرد.[٢٧٧] ئەوەی لێرەدا دەردەکەوێت، ئەو برە پارە زۆرەی کە لەلایەن ڕژێمی بەعسی عێراقەوە دژی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بەکارهێنراوە بەشی هەرە زۆری ئەو پارەیە لە ئەنجامی فرۆشتنی نەوتی کەرکوکەوە دەست حکومەتی بەعس کەوتبوو، کەواتە خۆماڵیکردنی نەوت لە عێراق بەگشتی و نەوتی کەرکوك بەتایبەتی باشترین کارت بوو کە بۆ هەرسپێهێنانی شۆڕشی ئەیلوول دەست حکومەت کەوت.

بە لێکۆڵینەوە و شرۆڤەکردنی کاری بەنێو خۆماڵیکردنی نەوت لە شاری کەرکوك، ئەو راستییانەی خوارەوە بەرجەستە دەبن:-

ا: ئەوەی راستی بێت خاکی کەرکوك چەندین کانزایی بەنرخی وەك (کبریت و نەوت و مس و خوی و قیر و قورقوشم... تاد..)ی تێیدایە، بەڵام شلەمەنییە کانزاییەکە، چەرخی شارستانییەت دەسووڕێنێتەوە و گڕ لەباری سیاسەت بەردەدات و ئاگری جەنگ هەڵدەگیرسێنێت و ڕووخساری مێژووی کەرکوکی گۆڕی، بریتییە لە نەوت، هەر نەوتیش بوو وای لە حکومەتە یەك لەدوایەکەکانی عێراق کردووە لە سەردەمی هاشمییەوە تا بەعسییەکانیش، کە نەوتی ئەو شارە لەپەرەپێدان و گەشەکردنی کەرکوکدا خەرج نەکەن و کردوویانەتە هۆیەك بۆ دوواخستنی کەرکوك و بەکارهێنانی زەبرو زەنگ وتوندوتیژی دژی ئەو شارە.

ب: کاری خۆماڵیکردنی نەوت لە کەرکوك، واچاوەڕواندەکرا لەبواری کارو بژێویی نەتەوەی کوردو کەمە نەتەوەو ئایینەکانی ئەو شارە بگەشێنێتەوە، بەڵام بەپێچەوانەوە کارو بژێوی کوردی شارەکە بەرتەسککرایەوە تا ژیانیان لەو شارەدا گران بێت و جێبهێڵن. لەگەڵ ئەوەشدا دەرگای کارو ئابووری بەسەر عەرەبەکاندا والاکرا، بەو ئاراستەیەی کە گەشە بە سیاسەتی بەعەرەبکردن و ڕاگواستن لە کەرکوکدا بدات.

ج: لە ساڵی ١٩٧٣ کۆمپانیای نەوتی عێراق، کە نێوەندەکەی لە کەرکوك بوو، لەدەستی ئینگلیز دەرهێنراو بووبە موڵکی عێراق و کەرکوك، بەڵام بەعسییەکان کە ئەو نەوتەیان کەوتە دەست، لەجێی ئەوەی بۆ خزمەتی گەلی عێراق بەکاری بهێنن، لە دژی نەتەوە و کەمە نەتەوە و ئایینەکانی کەرکوك بەگشتی و کورد بەتایبەتی بەکاریان هێنا. هەر بۆیە کاری بەنێو خۆماڵیکردن پێوەندییەکانی کوردو دەسەڵاتدارانی عێراقی ئاڵۆزترکرد، چونکە کاری لەباری ناوچە نەوتییەکانی کەرکوك کرد، ئەوەش ترس و نیگەرانی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردی زۆرتر کردو لەوە دەترسان نەوتی کەرکوك ببێتە (نەوتی عەرەب).

د: حکومەتی بەعسی عێراق، نەوتی کەرکوکی بە دوو شێوە دژی کوردانی شارەکەو باشووری کوردستان بەکارهێناوە. یەکەمیان: بە پارەی نەوتی شارەکە چەك و تەقەمەنی دەکری دژی کوردان بەکاری دەهێنا. دووەمیان: بە پێدانی هەندێ جیاوکی نەوتی کەرکوك،وڵاتە زلهێزەکانی دەگونجاند لەگەڵ سیاسەتە شوڤێنییەکانی دژ بە کوردی کەرکوك و باشوور.

*** سەرچاوە و پەراوێزەکان:-**

١- ئەم ژمارەیە بۆ هێزی پێشمەرگەی ئەوکات زیادەڕۆیی تێدایە. (توێژەر).
٢- د. گوینتەر دێشنەر: کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، و. حەمەکەریم عارف، چاپ دووەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٩، ل٢١٣.
٣- ئورخانی غالب: شۆڕشی ئەیلوول و رۆژگاری دوای هەرەس، چاپخانەی هەڵوێست، لەندەن، ١٩٩٠، ل١٧-١٨.
٤- د. سعد ناجي جواد: العراق والمسألة الكردية ١٩٥٨-١٩٧٠، ل١٥٩.
٥- جيرارد جالديان، المسألة الكوردية، د. عبدالسلام النقشبندي، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٧، ل١٠٩.
٦- بڕوانە: کریس کۆچێرا: کورد لەسەدەی نۆزدە و بیست دا، د. حەمەکریم عارف، ل٣٤٧.، پرۆفیسۆر لۆکمان مهۆ: کوردو کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا (کوردستانی عێراق)، و. وریا رەحمانی، بەشی یەکەم، ل١٨٤.
٧- بڕوانە: کریس کۆچێرا: کورد لەسەدەی نۆزدە و بیست دا، د. حەمەکریم عارف، چ٣، ل٣٤٧-٣٤٨.
٨- جيرارد جالديان: المساله الكورديه، د. عبد السلام النقشبندي، ل١٠٩.
٩- ئورخان غالب: شۆڕشی ئەیلوول و رۆژگاری دوای هەرەس، ل٢٤.
١٠- د. مكرم طالباني: مراحل تطور الحركة القومية الكردية، المجلد الأول، ل٢٧٥-٢٧٦.
١١- جەمال نەبەز:کوردستان و شۆڕشەکەی، ل٢٠٠.
١٢- نازناز محەمەد عبدالقادر: سیاسەتی ئێران بەرامبەر بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردلە کوردستانی عێراق (١٩٦١-١٩٧٥)، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل١٧٥.
١٣- حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی- عێراق، راپۆرتی سیاسی سەر بەهەشتەم کۆنگرەی هەرێمایەتی، کانوونی دووەمی ١٩٧٤، دار الحريە للگباعە، بغداد، ١٩٩٧، ل١١٢.
١٤- دیڤید ماکدواڵ: مێژووی هاوچەرخی کورد، و. ئەبوبەکر خۆشناو، ب٢، ل٥٦٠.
١٥- رەجائی فاید: کوردەکانی عێراق هیواو ئاوات لەنێوان بەدیهاتن و بەدینەهاتن، و. عەلی میرزا عارف هەورامی، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠١٠، ل٢٠٧.
١٦- دیڤید ماکداوڵ: مێژوویی هاوچەرجی کورد، و. ئەبوبەکر خۆشناو، ب٢، ل٦٧٢-٦٧٣.
١٧- د. مکرم طالباني: مراحل تطور الحركة القومية الكردية، المجلد الأول، ل٢٩٦.
١٨- دیڤید ماکداوڵ: مێژوویی هاوچەرخی کورد، و. ئەبوبەکر خۆشناو، ب٢، ل٦٧٣-٦٧٤.
١٩- فەرەیدون عبدولرەحیم عەبدوڵلا: بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق (١ای مارتی ١٩٧٠-١١مارتی ١٩٧٤)، نامەی ماجستێر، بەشی مێژوو، کۆلیژی ئەدەبیات، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٥، ل٢٥.
٢٠- جەمال نەبەز: دۆزی ناسیونالی کورد، بنکەی چاپەمەنی ئازاد، سوید، ١٩٨٥، ل٦٢.
٢١- جەمال نەبەز: کوردستان و شۆڕشەکەی، چ٣، ل٩٩.
٢٢- بڕوانە:صلاح الخراسان: التيارات السياسة في كردستان العراق، ل١٧٥-١٧٦.، جەمال نەبەز: دۆزی ناسیونالی کورد، ل٦٢.
٢٣- سەددام حوسێن: سەنگەرێك یان دووسەنگەر، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٧، ل٤٢.
٢٤- د. مكرم طالباني:مراحل تطور الحركة القومية الكوردية، المجلد الأول، ل٢٩٦-٢٩٧.
٢٥- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان و شۆڕشی ئەیلوول بنیادنان و هەڵتەکاندن ١٩٦١- ١٩٧٥، ل٢٩٢.
٢٦- فەرەیدون عەبدولرەحیم عەبدوڵلا: بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق (١١ی مارتی ١٩٧٠-١١ی مارتی ١٩٧٤)، ل٢٧.
٢٧- رەجائی فاید: کوردەکانی عێراق، و. عەلی میرزا عارف هەورامی، ل٢٠٣-٢٠٤.
٢٨- کاوە نادر قادر: رۆلی نەوت لە چارەنووسی گەلی کوردستاندا، کتێبی رووناکبیری(ی.ن.ك)، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٣٠٣.
٢٩- د. صالح ملا عمر عیسی: قەیرانی زلهێزەکان لە کوردستانی عێراقدا، و. سلێمان تاشان، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل١٨٧.
٣٠- د. منوچهر پارسادۆست: ناکۆکی ئێران - عێراق، و. محسن علی، سلێمانی، ١٩٩٥، ل٦٣.
٣١- جەمال نەبەز: کوردستان و شۆڕشەکەی، چ٣، ل٢٠١-٢٠٢.
٣٢- د. حامد محمود عيسي: القضية الكوردية في العراق من الاحتلال البريطاني الى الغزو الأمريكي، ل٣٥٢.
٣٣- چاوپێکەوتن لەگەڵ(د. مەحمود عوسمان)، سلێمانی، شەوی ٢٠١٠/٢/١٨/١٧.
٣٤- وەرگیراوە لە: جەمال نەبەز: کوردستان و شۆڕشەکەی، چ٣، ل١٨٩.
٣٥- د. حامد محمود عيسي: القضية الكوردية في العراق من الاحتلال البريطاني الى الغزو الأمريكي، ل١٩١٤-٢٠٠٣، ل٣٥٢.، د. مكرم الطالباني: كردستان الحقوق القومية للتركمان، ل٣٢.
٣٦- وەرگیراوە لە: دیڤید ماکداوڵ: مێژوویی هاوچەرخی کورد، و. ئەبوبەکر خۆشناو، ب٢، ل٦٧٥.
٣٧- یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە(١٨ی شوباتی ساڵی ١٩٥٣)دامەزراوە و ئەحمەد عەبدوڵلا یەکەم سەرۆکی ئەو رێکخراوە بووە. (فەرەیدون عەبدولرەحیم عەبدوڵلا: بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق ١١ی مارتی ١٩٧٠- ١١ ی مارتی ١٩٧٤، ماستەرنامە، ل١٥).
٣٨- مەسعود بارزانی: بارزانی وبزووتنەوەی رزگاریخوازیی کورد، و. لیژنەیەك، ب٣، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،

هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٢١.

٣٩- بۆ زانیاریی پتر، بڕوانە: الجمهوریة العراقیة: القرارات العامة لمجلس قیادة الثورة ١٩٦٨-١٩٧٧، المجلد الأول، مطبعة العاني، بغداد، ١٩٧٩، ل٥٩٧-٥٩٩.

٤٠- وەرگیراوە لە: جەمال نەبەز: کوردستان و شۆڕشەکەی، چ٣، ل١٩٣-١٩٤.

٤١- وەرگیراوە لە: مکرم طالباني: مراحل تطور الحرکة القومیة الکردیة، المجلد الأول، ل٢٧٧-٢٧٨.

٤٢- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان وشۆڕشی ئەیلوول بنیادنان و هەڵتەکاندن، ١٩٦١-١٩٧٥، ل٢٥٠.

٤٣- عەزیز شەریف: ساڵی ١٩٠٩ لەشارۆچکەی (عانە)ی سەر بە پارێزگای ڕومادی لە دایك بووە، دواتر بۆتە ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق. لەکەسایەتییە یەکەمە کان بووە کە پەیوەندیی بە حیزبی شیوعیی عێراقەوە کردووە، لە سییەکاندا کۆلێژی ماف تەواو کردووە و بووەتە حاکمی بەسراو دواتریش بووەتە ئەندامی دادگای تێهەڵچوونەوە. ساڵی ١٩٤٦ پارتێکی بەناوی (حیزب ئەلشەعب) دامەزراندوساڵی ١٩٦٠ خەلاَتی (لینین)ی لەپای تێکۆشانی بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتی پێدراوە، لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٩دا بووەتە وەزیری داد، یەکێك لەو کەسایەتییانەبووە کە هەوڵی هێنانە ئارای بەیاننامەی ١١ ی ئازاری داوە و ساڵی ١٩٩٠ کۆچی دوایی کرد. (فەرەیدوون عەبدولرەحیم عەبدوڵلا: بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق ١١ی مارتی ١٩٧٠- ١١ ی مارتی ١٩٧٤، ل١٦).

٤٤- مەسعود بارزانی: بارزانی وبزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کورد، و. لیژنەیەك، ب٣، ل٢٢.، دریە عوني: عرب واکراد خصام ام وئام، ل٨٨.

٤٥- مەسعود بارزانی: بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کورد، و. لیژنەیەك، ب٣، ل٢٣-٢٤.

٤٦- د. ميڤان عارف بادي: موقف الاحزاب السياسية العراقية من القضية الکردية ١٩٤٦- ١٩٧٠، ل٢٨٣.

٤٧- مەسعود بارزانی:بارزانی وبزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد، و. لیژنەیەك، ب٣، ل .، کریس کۆچێرا: کورد لەسەدەی نۆزدەوبیستەم دا، و. حەمەکریم عارف، ل٣٥٤-٣٥٥.

٤٨- سعد ناجي جواد: العراق والمسألة الکردية ١٩٥٨- ١٩٧٠، ل١٦٢.

٤٩- دارا تۆفیق ساڵی ١٩٣٢ لە سلێمانی لەدایکبووەو ساڵی ١٩٥٧ لە ئینگلتەرا کۆلێژی ئەندازیاری بەشی مەدەنی تەواوکردووە، دۆستێکی نزیکی مستەفا بارزانی بوو، لە کۆنگرەی هەشتەمی پارتیدا بووەتە ئەندامی کۆمیتەی نێوەندی، لەڕاگەیاندنی پارتیدا ڕۆڵێکی دیاری گێڕاوە و لە ڕۆژنامەو گۆڤاری برایەتی کاری کردووە وماوەیەکیش سەرنووسەری ڕۆژنامەی (التآخي) بووە، لە ڕۆژی ١٩٨٠/١١/٥ شوێن بزربووە. (فەرەیدوون عەبدولرەحیم عەبدوڵلا: بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق ١١ی مارتی ١٩٧٠- ١١ ی مارتی ١٩٧٤، ل١٨).

٥٠- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان و شۆڕشی ئەیلوول بنیادنان و هەڵتەکاندن، ل٢٥٠.

٥١- فەرەیدوون عەبدولرەحیم عەبدوڵلا: بارودۆخی سیاسیی کوردستان- عێراق ١١ی مارتی ١٩٧٠- ١١ ی مارتی ١٩٧٤، ل١٨.

٥٢- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان و شۆڕشی ئەیلوول بنیادنان و هەڵتەکاندن، ل٢٥٠:

٥٣- مەسعود بارزانی: بارزانی وبزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کورد، و. لیژنەیەك، ب٣، ل٢٤.

٥٤- فەرەیدون عەبدولرەحیم عەبدوڵلا: بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق (١١ی مارتی ١٩٧٠-١١ی مارتی ١٩٧٤)، ل١٨-١٩.

٥٥- جەمال نەبەز: ناسیونالی کورد، ل٢٩٦.

٥٦- چاوپێکەوتن لەگەڵ(دکتۆر مەحمود عوسمان)، سلێمانی، شەوی ٢٠١٠/٢/١٨/١٧.

٥٧- بۆزانیاریی لەمەڕ هەردوو نامەی (ئەحمەد حەسەن بەکر) ی سەرۆککۆماری عێراق و(مستەفا بارزانی)سەرۆکی پارتی. سەیری پەرتووکی (مەسعوود بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کورد، ب٣، ل ٢٧٣-٢٧٤، بکە).

٥٨- جەمال نەبەز: دۆزی ناسیونالیسی کورد، ل١٩٦. ؛ چاوپێکەوتن لەگەڵ (دکتۆر مەحموود عوسمان) سلێمانی، شەوی ٢٠١٠/٢/١٨/١٧.

٥٩- مەسعود بارزانی: بارزانی وبزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کورد، و. لیژنەیەك، ب٣، ل ١٩-٢٠.

٦٠- ئامادەکردنی: ئازاد سەراوی: بەرەو کەرکوك، بەرگی یەکەم، شەهید ئازاد هەورامی، کوردستان، کەرکوك، ٢٠٠٧، ل١٩.

61- Towell,P. Bush:warns Iraqi Government Not To Attack Fleeing Kurds,'congressional Quarterly,Vol. 49,1991,p. 93.

٦٢- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان و شۆڕشی ئەیلوول بنیادنان و هەڵتەکاندن، ل٢٥٤.

٦٣- غەفوور مەخموری: بەعەرەبکردنی کوردستان - بەعەرەبکردن مەترسییەکانی، بەرەنگاربوونەوەی، ل٣٧.

٦٤- نادر ئینتسار: ئیتۆ نەتەوایەتی کوردی، و. عەتا قەرەداغی، ل١٠١.

٦٥- د. خلیل ئیسماعیل محەمەد: گۆڕینی سنووری ئیداری پارێزگای کەرکوك، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە(٢١)، شوباتی ١٩٩٨، ل٣٥.

٦٦- چاوپێکەوتن لەگەڵ (د. مەحمود عوسمان)، سلێمانی، شەوی ٢٠١٠/٢/١٨/١٧.

٦٧- ئیبراهیم جەلال: خوارووی کوردستان و شۆڕشی ئەیلوول بنیادنان و هەڵتەکاندن، ل٢٥٤.

٦٨- چاوپێکەوتن لەگەڵ (د. مەحمووود عوسمان)، سلێمانی، شەو٢٠١٠/٢/١٨/١٧. ؛ چاوپێکەوتن لەگەڵ (نەوشیروان مستەفا ئەمین)، لە ساڵی ١٩٤٢ لە سلێمانی لەدایك بووە و لەوێ خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی تەوا کردووە ودواتر لە ساڵی ١٩٦٤ دا کۆلێجی زانستە رامیارییەکانی لە زانکۆی بەغداد تەواو کردووە هەرلەسەرەتاکانی ژیانییەوە بەشداریی چەندین کۆمەڵەو ڕێکخراو و پارتی سیاسییدا

كردووە و یەكێك بووە لە دامەزرێنەرە سەرەكییەكانی كۆمەڵەی ڕەنجدەران و یەكێتی نیشتمانیی كوردستان، لە بواری ڕۆشنبیر ومێژوویی و ڕۆژنامەگەریدا خاوەنی چەندین بەرهەمە، و ئێستاش سەرۆكی بزووتنەوەی گۆڕانە، سلێمانی، ڕۆژی یەكشەممە، ٢٠١٠/١/١١.

٦٩- حەردان تكریتی لە سالی ١٩٢٥ لە تكریت لەدایك بووە، كۆلێژی فرۆكەوانی تەواوكردووە و جێگری سەرۆكی هێزە چەكدارەكانی عێراق وجێگری سەرۆك وەزیران بووە، وەزیری بەرگری بوو لە سالآنی (١٩٦٨-١٩٧٠). (حنا بطاطو: العراق الشیوعیون والبعثیون والضباط الاحرار، ت. عفیف الرزاز، ل٤٠٢).

٧٠- عەبدوڵلا سەلووم ئەلسامەرائی لە ساڵی ١٩٣٢ لە سامەرا لەدایك بووە، هەڵگری بڕوانامەی ماستەر بووە لە مێژوویی ئیسلامی دواتر دكتۆرای وەرگرت، بۆ سالآنی (١٩٦٨-١٩٦٩) وەزیری ڕاگەیاندن بوو، دواتر بووەتە وەزیری دەوڵەت، ئەندامی سەركردایەتیی هەرێمیی پارتی بەعس بوو تاساڵی ١٩٧٠ وپاشتر بووەتە باڵوێزی عێراق لە هندستان. (هەمان سەرچاوە، ل٤٠٣).

٧١- سەركردەكانی ڕژێمی عێراق بەزۆری خەسڵەتی كوردستانیبوونی كەركوكیان لەكاتی دانووستانەكان لەگەڵ كوردا ڕەت نەكردووەتەوە، واتە نكوڵیان لە كوردستانیبوونی كەركوك نەكردووە، بەڵام بیانوییان دەهێنایەوە بۆ نەخستنە سەر كوردستان، جارێك بەوەی شەرمەزارن لەبەرامبەر جەماوەرەكەیان و جارێك بەبیانووی شەریان لەگەڵ دەوڵەتە بیانییەكان و جارێك بیانووی ئەوەی دانیشتووانی شارەكە تێكەڵییەكی (ئاینی و نەتەوەیی)ەو پێویست بە شێوازێكی گونجاندن دەكات، سەرچاوەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەنجامی سیاسي نەك یاسایی. (د. نووری تاڵەبانی: پێشنیارە دەستووریەكان كێشەی كورد ئاڵۆز دەكات نەك چارەسەر، گۆڤاری كەركوك، ژمارە(. ٢-٣)، پاییزی ١٩٩٩ و زستانی ٢٠٠٠، ل١٢٤).

٧٢- چاوپێكەوتن لەگەڵ (د. مەحمود عوسمان)، سلێمانی، شەوی ٢٠١٠/٢/١٨/١٧.

٧٣- جەرجیس فەتحوڵلا: شاری كەركوك لە ڕووی مێژوویی وزانستی ڕەگەزی (ئەتنۆگرافی)وهەوڵی بەعەرەبكردنی شاری كەركوك، كێشە لەسەر پێكهاتەی ڕەگەزی (ئەتنی) و هەوڵدان بۆ بە عەرەبكردنی، سەنتەری برایەتی، ژمارە(٢٠) هاوینی ٢٠٠١، ل٢٥٨-٢٥٩.

٧٤- د. میڤان عارف بادی: موقف الاحزاب السیاسیة العراقیة من القضیة الكوردیة ١٩٤٦- ١٩٧٦، ل٢٨٣-٢٨٤.

٧٥- چاوپێكەوتن لەگەڵ (د. مەحمود عوسمان)، سلێمانی، شەوی ٢٠١٠/٢/١٨/١٧.

٧٦- بڕوانە: د. میڤان عارف بادي: موقف الاحزاب السیاسیة العراقیة من القضیة الكوردیة ١٩٤٦- ١٩٧٦. ؛كریس كۆچێرا: كورد لەسەدەی نۆزدە و بیستەم دا، د. حەمەكریم عارف، ل٣٥٧.

٧٧- ئیبراهیم جەلال: خوارووی كوردستان وشۆڕشی ئەیلوول بنیادنان و هەڵتەكاندن، ل٢٥٠.

٧٨- د. محمد عمر مولود: الفیدرالیة وإمكانیة تطبیقها في العراق، ل١٧٣.

٧٩- ڕۆژی ئاشتی ١١ی مارتی ١٩٧٠، گۆڤاری دەفتەری كوردەواری، بەرگی دووەم، مارت و نیسانی ١٩٧٠، بەغدا، ل١٥٤.

٨٠- بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (١٧).

٨١- بۆ دەقی ناوكەوانەكانی بەیاننامەكە، بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (١٧).

٨٢- لەتیف فاتح فرج: كوردو كەركوك، ب١,ل ٧٧.

٨٣- بەعس لەگەڵ گرتنە دەستی دەسەڵات بۆ ئەوەی ڕێژەی عەرەب لەشاری كەركوك زیادبكات، هەرماڵە عەرەبێكی هێنابێتە كەركوك دەستبەجێ تۆماری كەسێتی (سجل نفوس) ی ساڵی ١٩٥٧ ی بۆ دروستكردووە. لەبەرئەوەی تۆماری ١٩٥٧ لای كورد و بێگانە ئەو سەرژمێرییە كە سەبارەت بە كەركوك، تارادەیەكی بەرچاولەوانتر باشترەو هەڵەی كەمتر تێدایە، بۆیە حكومەتیش كاری بۆ شێواندنی ئەمە كردووە. (لەتیف فاتح فرج: كوردو كەركوك، ب١، ل١٢٣).

٨٤-وەرگیراوە لە:پارتی دیموكراتی كوردستان(سەركردایەتیی كاتی): ڕێبازی بزووتنەوەی ئازادیخوازی كورد هەڵسەنگاندنی شۆڕشی ئەیلوول وبەرنامەی نوێی پارتی دیموكراتی كوردستان، ڕاپۆرتی سیاسی سەركردایەتی پارتی دیموكراتی كوردستان لەلایەن كۆنفراسی پارتی یەوەلە(١١-١٥ی ئابی ١٩٧٥) پەسەندكراوە، ل٦٢-٦٣).

٨٥- وەرگیراوە لە: د. مكرم طالباني: مراحل تطور الحركة القومیة الكردیة، المجلد الأول، ل٣٤٥-٣٤٦ ؛ جەرجیس فەتحوڵلا: شاری كەركوك لە ڕووی مێژوویی وزانستی ڕەگەزی (ئەتنۆگرافی)و هەوڵی بەعەرەبكردنی شاری كەركوك، كێشە لەسەر پێكهاتەی ڕەگەزی... .، سەنتەری برایەتی، ژمارە(٢٠) هاوینی ٢٠٠١، ل٢٥٩.

٨٦- چاوپێكەوتن لەگەڵ (د. مەحمووود عوسمان)، سلێمانی، شەوی٢٠١٠/٢/١٨/١٧.، بۆزانیاریی پتر، بڕوانە: كەمال مەزهەر: كوردو كوردستان لەبەڵگەنامەكانی حكومەتی بەریتانیادا، ل٥٧١.

٨٧- حبیب محمد كریم: بحوث المؤتمر العلمي حول كركوك، اربیل، ٢٠٠١، ل٢٦١.

٨٨- ئامادەكردنی: پرۆفیسۆر لوكمان میهۆ:كوردو كوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەكانی ئەمریكادا (كوردستانی عێراق)، و. وریا ڕەحمانی، بەشی یەكەم، ل٤٨.

٨٩- ڕۆژنامەی (كوردستان) ئۆرگانی كۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموكراتی كوردستانی - ئێران، دووهەمین بیرەوەی بەیاننامەی 11 ی مارس، ژمارە(١٤)، مارس ١٩٧٢. ؛ این محمدی (كلهر): سیردر تاریخ سیاسی كردوكردهای عێراق، چاپ اول، بێ شوین و ناوی چاپخانە، ١٣٨٢ هەتاوی، ل١١١.

٩٠- فەرەیدون عبدولرەحیم عەبدوڵلا: بارودۆخی سیاسی كوردستان- عێراق (١١ی مارتی ١٩٧٠-١١مارتی ١٩٧٤)، ل٢٥.

٩١- چاوپێكەوتن لەگەڵ (د. مەحمود عوسمان سۆرانی)،

سلێمانی، شەوی ١٧/١٨/٢/٢٠١٠.
٩٢- حەسار گوندێکی نزیك بەنێوندی قەزای کەرکوك، دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای شارەکە. (توێژەر).
٩٣- چاوپێکەوتن لەگەڵ (ئیسماعیل حیدەر عەلی) سلێمانی، یەك شەممە، ٢٤/١/٢٠١٠.
٩٤- ئەم پەیماننامەیە پێشوازییەکی گەورەو رەنگدانەوەیەکی زۆر و لێکدانەوەی زۆری بۆکرا، لەسەر ئاستی کوردستانی گەورە و وڵاتانی عەرەبی وجیهانی. (بۆیتر زانیاری، بروانە: فەرەیدون عبدولرەحیم عەبدوڵلا: بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق (١١ی مارتی ١٩٧٠-١١مارتی ١٩٧٤)، ل٢٨-٣٨. ؛ جەمال نەبەز: کوردستان و شۆرشەکەی، ل٢٠٢ -٢٣٩).
٩٥- چاوپێکەوتن لەگەڵ(مامۆستا وریا حەسەن محەمەد)، دوکان، رۆژی پێنج شەممە، ١٧/ ٦/ ٢٠١٠.
٩٦- سۆزان: بەعسیزم و کورد، ل٢١٥.
٩٧- د. رەفیق شوانی: وتارەکانم دەربارەی کێشەی کورد، ل٢٠٣- ٢٠٤.
٩٨- لەتیف فاتح فەرج: کوردو کەرکوك، ب١، ل٦٢. ؛ سمکۆ بەهرۆز (ئەژی): مێژووی گۆرانە رۆشنبرییەکانی ناوچەی کەرکوك، ل٣٢-٣٣.
٩٩- وەرگیراوە لە/ ئا: عەدنان کاکە رەش: کەرکوك بۆمێژوو دەدوێت، ل١٦٩.
١٠٠- سۆزان کەریم مستەفا: بەعسیزم و کورد، ل٢١٥-٢١٦. ؛ نەوشیروان مستەفا ئەمین: پەنجەکان یەکتری دەشکێنن، ل١٠٠.
١٠١- لە حەفتاکاندا(یەکێتی نووسەرانی کورد)دامەزرا، بێگومان هەوڵدان بۆ دامەزراندنی ئەو رێکخراوە بۆ پێش پەیماننامەی ١١ ئازار دەگەرایەوە، کاتێك بەیانی ١١ی ئازار هاتە پێشەوە، ئیتر بارێکی گونجاو رەخسا بۆ گەشەکردن و کرانەوەی رۆشنبیریی کورد و لە هەموو بوار و ئاستەکاندا کە یەکێتی نووسەرانی کورد دامەزرا، لقێك لە کەرکوك کرایەوە و سەرۆکی لقەکان دەگۆرران و هەرجارەو یەکێك دەبووە سەرۆك، ئەوانەی کە دەوریان هەبوو لە کەرکوك وەك سەرۆکی لق (شێخ رەئووف خانەقا و شێخ عەبدولعەزیزی خانەقا)بوون. کە کۆمەڵێکی زۆر لە دانیشتووانی کەرکوك و دەوروبەری کەرکوك وئەوانەی ئەندامی یەکێتی نووسەران بوون، سەردانی لقی کەرکوکیان دەکرد و یەکێتی نووسەرانی کەرکویش چالاکی زۆری دەکرد، بەردەوام فیستڤاڵ و کۆر و کۆبوونەوەی شیعر و خوێندنەوەی چیرۆك و هونەری شانۆییان دەکرد، ئەوەش کاریگەریی زۆری لە پێشکەوتنی رۆشنبیریی کەرکوکدا هەبوو. (ئا: عەدنان کاکەرەش: کەرکوك بۆ مێژوو دەدوێت، ل١٦٣-١٦٤).
١٠٢- بۆزانیاریی پتر، بروانە: فەرەیدوون عبدولرەحیم عەبدوڵلا: بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق (١١ی مارتی ١٩٧٠-١١مارتی ١٩٧٤)، ل ٣٩-٤٩. ؛ جەمال نەبەز: کوردستان و شۆرشەکەی، ل٢٠٨-٢١٩. ؛ کریس کۆچێرا: کورد لەسەدەی نۆزدە و بیست دا، د. حەمە کەریم عارف، ل٣٤٧.، رەجائی فاید: کوردەکانی عێراق، و. عەلی میرزا عارف هەورامی، ل٢٢٣- ٢٢٤. ؛ سەرپەرشتیاری نووسین (ژیرارد چالیان): گەلێکی پەژمووردەو نیشتمانێکی پەرت(کورد و کوردستان)، و. م/ کۆمەیی، سوید، ١٩٩٨، ل٢٩٢-٢٩٧. ؛ د.جەمال رشید ئەحمەد: کەرکوك و ناوچەی گەرمیان و ماڤ کۆنترۆڵکردنیان لەلایەن کوردەوە، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٨، ل٥٣-٥٤.
١٠٣ – فوئاد حەمە خورشید: کەرکوك لە بەڵگەنامەکاندا، و. نەریمان عەبدوڵلا خۆشناو، ل١٤٤.
١٠٤ – بروانە بەشی دووەم / باسی دووەم (بەعەرەبکردنی کەرکوك)، لەلاپەرە ( ١٥٢-١٨٩).
١٠٥- بروانە: نازناز محەمەد عبدولقادر: سیاسەتی ئێران بەرامبەر بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد لە کوردستانی عێراق ١٩٦١-١٩٧٥، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل١٧٧. ؛ د. مكرم طالباني: مراحل تطور الحركة القومية الكردية، المجلد الأول، ل٣٤٥-٣٤٦. ؛ستران عەبدوڵلا: رازەکانی تەعریب و راگواستن، ل١٥٧.
١٠٦- مؤلف تنفيذ (١١) اذار، وزارة الاعلام العراقية، بغداد، ١٩٧٢، ل١٢١.، د. محمد هماوەند:راگواستن، ل٢٣.
١٠٧- د. حامد محمود عيسى: المشكلة الكردية في الشرق الوسط منذ بدايتها حتى سنة ١٩٩١، القاهره، ١٩٩٢، ل٢٣٢.
١٠٨- دیڤید ماکداول: مێژوویی هاوچەرجی کورد، و. ئەبوبەکر خۆشناو، ب٢، ل٦٨٧.
١٠٩- ئەمین قادر مینە: ئەمنی ستراتیجی عێراقی و سیکۆچکەی بەعسییان(تەرحیل، تەعریب، تەبعیس)، ل٢٤١. ؛ خەسرەو گۆران: بوونی کورد لە پارێزگای مووسڵ، سەنتەری برایەتی، ژ(٢)، ئەیلوولی ١٩٩٩، ل٤٨.
١١٠- وەرگیراوە لە: ئەحمەد عەزیز: راستیی شاری کەرکوك لەنێوان رابردوو و باری ئەمرۆدا، ل١١.
١١١- جەمال نەبەز: کوردستان و شۆرشەکەی، ل٢١٨.
١١٢- سلسلة دراسات سياسية(عدد خاص بالمسألة الكردية في العراق)، دار القدس، بيروت، لبنان، ١٩٧٥، ل١٩٠.
١١٣- سنوور سەباح سدیق: مێژووی سیاسەتی بەعەرەبکردنی پارێزگای کەرکوك ١٩٦٣-١٩٩١، ل٩٥.
١١٤- نادر ئنتیسار: ئیتنۆ نەتەوایەتی کوردی، و. عەتا قەرەداغی، ل١٠١.
١١٥- دیڤید ماکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد، و. ئەبوبەکر خۆشناو، ب٢، ل٦٨٢.
١١٦- کریس کۆچێرا: بزووتنەوەی نەتەوەی کورد و هیوای سەربەخۆیی، و. ئەکرەم میهرداد، بەرگی یەکەم، سەنتەری چاپ و پەخشی نەما، ٢٠٠٢، ل٣٥.
١١٧- صدامات بين السلطة والاكراد، مجلة الحرية، عدد(٥٨٠)، بيروت، ١٩٧١، ل٦.
١١٨- د. حامد محمود عيسي: المشكلة الكردية في الشرق الوسط منذ بدايتها حتى سنة ١٩٩١، القاهرة، ١٩٩٢، ل٢٢٦.
١١٩- کریس کۆچێرا: کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستەم دا، و. حەمەکریم عارف، ل٣٧٥.
١٢٠- وەرگیراوە لە: جەمال نەبەز: کوردستان و شۆرشەکەی، ل٢٠٨.

١٢١- زاهیر رۆژبەیانی: پەیام، گۆڤاری هاواری کەرکوک، ژمارە(١٠)، ئەیلوولی ١٩٩٨، ل٧.

١٢٢- وزارة الاعلام: قانون الحكم الذاتي، طبعة الثالث، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٣، ل١٠.

١٢٣- پرۆفیسۆر لوکمان میهۆ: کوردو کوردستان لەبەڵگەنامەنهێنیەکانی ئەمریکادا(بەشی یەکەم/ کوردستانی عێراق)، و. وریا رەحمانی، ل٢١٤.

١٢٤- غەفور مەخموری: بەعەرەبکردنی کوردستان – بەعەرەبکردن مەترسییەکانی، بەرەنگاربوونەوە، ل٣٧.

١٢٥- سنوور سباح سدیق: مێژووی بەعەرەبکردن لە پارێزگای کەرکوک ١٩٦٣-١٩٩١، ل٩٨.

١٢٦- بروانە: د. حامد محمود عیسى: القضية الكوردية في العراق من الاحتلال البريطاني الي الغزو الأمريكي ١٩١٤-٢٠٠٤، ل٣٦٤-٣٦٦. ؛ د. محمد هماوند: الفيدرالية والحكم الذاتي واللامركزية الادارية الاقليمية (دراسة نظرية مقارنة)، الطبعة الثاني، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١، ل٩٩-١٠٠.

١٢٧- مەسعوود بارزانی: بارزانی وبزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، و. لیژنەیەک، ب٣، ل٨٤٩-٨٥٢.

١٢٨- رژێمی بەعس هەمیشە لەپلانێک دەگەرا بۆ ئەوی بتوانێت بەتەواوی شۆرشی کورد بەرتەسک وبچووک بکاتەوەو حیزبە سیاسییەکان بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. لەم پێناوەشدا بەعسییەکان دەستیاندایە پێوەندیکردن و گفتوگۆکردن لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی عێراق و بارزانی بەمەبەستی گوایا چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوانیان. سەرەتای ئەو پلانیشیان لە دروستکردنی (بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخواز) لەنێوان رژێمی بەعس و پارتە سیاسییەکاندا خۆی دەبینەوە، کە لە ساڵی ١٩٧١دا ئەم بیرەی هێنایە گۆری و سەرەتا داوای لە پارتی کۆمۆنیستی عێراق کرد کە بەشداری پرۆژەی دروستکردنی بەرە بکات، دواتر حیزبی شیوعی عێراق بەشداریکرد و دروستکرا. (سەروەر عەبدلرەحمان عومەر: پارتی کۆمۆنیستی عێراق و مەسەلەی کورد ١٩٣٤-١٩٧٥، ل٢٥٥).

١٢٩- فەرەیدون عبدولرەحیم عەبدوڵلا: بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق (١١ی مارتی ١٩٧٠-١١مارتی ١٩٧٤)، ل١٥١.

١٣٠- نادر ئنتسار: ئیتۆ نەتەوایەتی کوردی، و. عەتا قەرەداغی، ل ١٠٥.

١٣١- سنوور سەباح سدیق: مێژووی سیاسەتی بەرەعەبکردن لەپارێزگای کەرکوک ١٩٦٣-١٩٩١، ل٩٨. ؛ فەرەیدون عبدولرەحیم عەبدوڵلا: بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق (١١ی مارتی ١٩٧٠-١١مارتی ١٩٧٤)، ل١٥٢.

١٣٢- دکتور عبدالستار تاهیر شەریف: ململانی لەگەڵ ژیاندا ١٩٣٤-١٩٧١، ب١، چ١، ل١٣٩-١٤١.

١٣٣- ژیدارد چالیاند: گەلێکی پەژموردە و نیشتیمانێکی پەرت، و. م. گۆمەیەی، ل٣٠٥.

١٣٤- فەرەیدون عبدولرەحیم عەبدوڵلا: بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق (١١ی مارتی ١٩٧٠-١١مارتی ١٩٧٤)، ل١٥٢-١٥٣.

١٣٥- دریە عونی: عرب واكراد خصام أم وئام، ل٩١.

136- وەرگیراوەلە: ئەحمەد رەفیق کەریم: ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان (لێکۆڵینەوەیەک لە جوگرافیای سیاسی)، نامەی ماجستێر، بەشی جوگرافیا، کۆلیژی زانستە مرۆڤایەتییەکان/ زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٩، ل١٧٧. (بڵاو نەکراوە).

١٣٧- نەوشیروان مستەفا ئەمین: لەکەناری دانووبەوەبۆ خری ناوزەنگ (دیوی ناوەوە رووداوەکەوە کوردستانی عێراق ١٩٧٥-١٩٧٨، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، چ٢، سلێمانی، ١٩٩٧، ل١٩.

١٣٨- بروانە بەڵگەنامەی ژمارە(٢٧).

١٣٩- نادر ئنتسار: ئیتۆ نەتەوایەتی کوردی، و. عەتا قەرەداغی، ل١٠٥-١٠٦.

١٤٠- بروانە: د. محمد عمر مولود: الفيدرالية وامكانية تطبيقها في العراق، ل١٣٨-١٣٩. ؛ فەیسەل دەباغ: کوردو کەمە نەتەواییەکانی تر لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧دا، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ١٩٩٣، ل٣.

١٤١- ژێرارد چالیاند: گەلێکی پەژموردە و نیشتیمانی پەرت، و. م/ گۆمەیی، ل٣٠٥.

١٤٢- رێککەوتننامەی جەزائیر لەنێوان بەعسی عێراق و حکومەتی شای ئێران واژۆکرا، بەپێی ئەو رێککەوتننامەیە عێراق هەموو داواکارییەکانی ئێران بەفەرمی دەناساند، بەو مەرجەی ئێران لە دژایەتی کردنی کوردی باشوور یارمەتی عێراق بدات، بەوەش رێگەی لەهەمووهاوکاری و یارمەتییەکی گرت و هێزی کوردیش تووشی ئیفلیجی بوو، پاشان حکومەتی بەعس دەستی کردبەجێبەجێکردنی سیاسەتی راگواستن و کۆچپێکردنی بەکۆمەڵی هاووڵاتییانی کوردی باشوور بەگشتی و کەرکوک بەتایبەتی. (کەنعان مەکییە: کۆماری ترس، و. حەمە رەشید، ل٦٣).

١٤٣- دیڤید ماکداول: مێژوویی هاوچەرخی کورد، و. ئەبوبەکر خۆشناو، ب٢، ل٥٥٣.

144- S. H. Longrigg:Oil in the Moddle East، London. 1954. p. 16.

١٤٥- د. عبدالرحمن قاسملو: کوردستان و کورد، و/ عبدالله حسن زادە، بنکەی پێشەوا، ١٩٧٣، ل١٠٢.

١٤٦- دانیال یەرگین: نەوت و سیاسەتی نێودەوڵەتی لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا، و/کەمال شەریف، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژ(٤٠)، ساڵی سیازدەهەم، ٢٠٠٣، ل٢٦٣.

١٤٧- د. محمد ازهر سعيد السماك وزكريا عبدالحميد باشا: إقتصاديات النفط والسياسة النفطية، ل٨١.

١٤٨- ئازاد: مێژووی دۆزینەوەی دەرهێنانی نەوت لە کەرکوک، گۆڤاری کەرکوک، ژمارە(١)، ١٩٩٩، ل٥٠-٥١.

١٤٩- کۆمپانیای هێڵی ئەنادۆڵی عوسمانی لەلایەن بانکی ئەڵمانییەوە کۆنترۆڵ کرابوو، لە ساڵی ١٩٠٠ دا گرتنی دا بۆ وەدەستهێنانی ماڤ نەوت، لەسەر بنەمای توانای بەڵێنەکانی لە ساڵی (١٨٨٨)دا درابوو. S. H. Longrigg:Oil

.in the Moddle East. p27 )

١٥٠- عبدالمجيد فهمي: دليل تأريخ مشاهير الألوية العراقية، ج٢، ل١١.

١٥١- د. عەبدوڵڵا غەفوور: جوگرافیای ئابووری نەفت لە کوردستاندا، ل٣١.

١٥٢- د. محمد ازهر سعيد السماك وزكريا عبدالحميد باشا: إقتصاديات النفط والسياسة النفطية، ل٨١.

١٥٣- فەیسەڵ عەلی: ئابووری نەوت لە کەرکوک، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژ(٤٠)، ل٣١٤-٣١٥.

١٥٤- مكتب الدراسات والبحوث المركزي: نفط كردستان العراق، دراسة رقم(٣١)، طبعة الاول، ١، ١٩٩٧، ل١٤.

١٥٥- لەتیف فاتح فەرەج: کوردو کەرکوک، ب1، ل٨٩.

١٥٦- پ. د. میم کەمال ئۆڤە: کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی مووسڵ ١٩١٨-١٩٢٦، و. سەلام ناوخۆش، چاپخانەی خەبات، هەولێر، ٢٠٠٠، ل١٦.

١٥٧- وەلیدی حمدی: کوردو کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیا، و. محەمەد نووری توفیق، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٢٣.

١٥٨- د. محمد ازهر سعيد السماك وزكريا عبدالحميد باشا: إقتصاديات النفط والسياسة النفطية، ل٨٢-٨٤.

١٥٩- ئەم کۆمپانیایە بارەگاکەی لەلەندەن بوو، ناونرا بە کۆمپانیای نەوتی (تورکی و هیدیکە)، لەژێر چاودێریی(کاسل) پارێزگاری بانکی ئینگلیزی تێدا کراو سەدی پشکی کۆمپانیاکە بەم شێوەیە لەنێوان بەشداربووانی دا دابەشکرا:(بانکی خانەکی تورکی ٣٥٪ و بانکی ئەڵمانی ٢٥٪ و کۆمپانیای ریال شیل" کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی ساکسۆنسە خاوەنی بەریتانیا - هۆڵەندی "٢٥٪ و کوڵبەنیکیان ١٥٪بوو). (د. عبدالله غەفور: جوگرافیای ئابووری نەفت لەکوردستاندا، ل٣٢)

١٦٠- بڕوانە: پارتی دیموکراتی کوردستان (مەکتەبی سیاسی)، مەکتەبی ناوەندی دراسات وتووێژینەوە:نەوتی کوردستانی عێراق، ب٢، ل١٣. ؛ د. عبدالله غەفور: جوگرافیای ئابووری نەفت لەکوردستاندا، ل٣٢. ؛ عەلائەدن سجادی: گەشتێك بە کوردستانا، چاپخانەی مەعاریف، بغداد، ١٩٥٦، ل٨٠-٨١.

١٦١- د. صباح ذهب: البترول العرب الخام سوق العالمية، قاهيرة، ١٩٦٩، ل١٨.

١٦٢- یەکێکە لە رێککەوتننامە نهێنییەکانی ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهان، کەلەنێوان (١٥ بۆ ١٧ی مایسی ١٩١٦) دا، هەردوو دیپلۆماسی ئینگلیزی مارك سایکس وچاڵدی جۆرج پیکۆی فەرەنسا لەپاش گفتوگۆیەکی دووردرێژ گەیشتنە رێککەوتن لەسەر پەیمانێك کەبەناوی هەردوو نوێنەرەکەوە نێونرا(سایکس پیکۆ). دوایچوونی رووسیا بۆ نێو ئەو پەیماننامەیە و بەشداریکردنی، نێوەکەی گۆڕدرا بۆ (سایکس پیکۆ - سازەنۆڤ). (پ. د. ئازاد نەقشبەندی: رێککەوتننامەی سایکس پیکۆ و کوردستان، گۆڤاری سەرنتەری برایەتی، ژمارە(٧)، ئابی ١٩٩٨، ل٥. ؛ ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی: سایکس بیکۆ وترازاندنی جەمسەری کێشەی کوردی باشوور، چاپی دووەم، چاپەمەنی سلێمانی، ١٩٩٨، ل١٠).

١٦٣- د. كمال مظر احمد: اضواء على قضايا دولية في الشرق الاوسط، بغداد، ١٩٨٧، ل١٣٤.

١٦٤- محەمەد سەعید سۆفی: پارێزگای کەرکوک لەناوپاکتاوکردنی رەگەزییدا، ل٢٥.

١٦٥- پشکۆ تاهیر ئاغجەلەری: شاری کەکوك ١٩١٧-١٩٢٦، ل٢٥٣.

١٦٦- النفط والاكراد(دراسة علاقات العراقية- اسرائيلية- الكويتية)، دار الحكمة، لندن، ١٩٩٧، ل١٤.

١٦٧- پ. ی. د. دلێر ئیسماعیل حەقی شاوەیس: راستکردنەوە هەڵەیەکی مێژوویی، گۆڤاری ئەکادیمی، ژمارە(٤)، هەولێر ٢٠٠٦، ل٤.

١٦٨- د. محمد ازهر سعيد السماك وزكريا عبدالحميد باشا: إقتصاديات النفط والسياسية النفطية، جامعة الموصل، ١٩٨٠، ل١١٢.

١٦٩- د. فوئاد حمە خورشید: کەرکوك لەبەڵگە نامەکاندا، و. نەرمان عەبدوڵڵا خۆشناو، ل١٠٩-١١٠.

١٧٠- لەتیف فاتح فەرەج: کوردو کەرکوك، ب١، ل٨٨-٨٩.

١٧١- کالۆس سەرکیس کۆڵبنگیان، خەڵکی شاری (تالاس) ی ئەنادۆڵە و بەرەگەز ئەرمەنییە، کۆلیجی پاشایەتی بەریتانیای تەواوکردووە، یەکێك بووە لە راوێژکارە دڵسۆزەکانی بەریتانیا لە دەوڵەتی عوسمانیدا. لە وەزارەتی عوسمانیدا کاری کردووە و بە(مستەر سەدی پێنج_.Mr Five percent) ناسرابوو. ئەم پیاوە خزمەتێکی گەورەی بەریتانیای کردووە لە بواری وەرگرتنی ماف گەران و پشکنینی نەوتی عێراقی. لە ساڵی ١٩٥٦ کۆچی دوایی کردووە. (حكمت سامي سليمان: نفط العراق، دار الحرية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٧٩، ل٧٣)

١٧٢- عبدالرزاق الحسني: العراق قديماً وحديثاً، مطبعة عدنان، سوريا، صيدا، ١٩٥٦، ل٥٦-٥٨.

* ئەم کۆمپانیایە لە ساڵی ١٩٢٦ دامەزراوە. (توێژەر)

١٧٣- وەرگیراوە بە: فەیسەڵ عەلی: ئابووری نەوت لە کەرکوك، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژ(٤٠) ساڵی سیازدەهەم، شوباتی ٢٠٠٣، ل٣١٦.

١٧٤- دانیال یەرگین: نەوت و سیاسەتی نێودەوڵتان لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا، و. کەمال رەشید شەریف، ل٣٠٤.

١٧٥- د. احمد نجيب:دراسات جغرافية العراق الصناعية، بغداد، ١٩٧٥، ل١٣٦.

١٧٦- مجموعة الباحثين: كركوك مدينة القوميات المتآخية، ل٦٢١.

١٧٧- دانیال یەرگین: نەوت و سیاسیەتی نێودەوڵتان لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا، ل٣٠٤-٣٠٥.

١٧٨- گولەر سیامەنسوری: کەرکوك شاری ئاگری هەمیشەیی، گۆڤاری هاواری کەرکوك، ژ(٢)، کانوونی یەکەمی ١٩٩٨، ل٢٧-٣٨.

١٧٩- دانیال یەرگین: نەوت و سیاسیەتی نێو دەوڵتان لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا، ل٣٠٤-٣٠٥.

١٨٠- گولەر سیامەنسووری: کەرکوك شاری ئاگری هەمیشەیی، گۆڤاری هاواری کەرکوك، ژ(٢)، ل٣٨.

١٨١- د. عبدالله غفور: جوگرافیای ئابووری نەفت لە کوردستاندا، چ٢، ل٧٢.

١٨٢- د. نووری تاڵەبانی: ناوچەی کەرکوك و هەوڵی گۆڕینی باری نەتەوەیی ئەم ناوچەیە، و. محمد مەلاکەریم، چ٢، ل٤٩.

١٨٣- کوردێکی مێژوونووس: کەرکوك(ناوی - مێژووی کۆنی - دانیشتووانی -دەسەڵاتەکانی)، گۆڤاری هاواری کەرکوك، ژ(٢)، کانوونی یەکەمی ١٩٩٨، ل٢٩.

١٨٤- حکمت سامي سليمان: نفط العراق، (دراسة إقتصادية سياسية)، الحرية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٧٩، ل١١٧-١١٨.

١٨٥- دانیال یەرگین: نەوت و سیاسیەتی نێو دەوڵەتان لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا، ل٣٠٥.

١٨٦- لەبەر ئەوەی سەرمایەی هۆڵەندا لە کۆمپانیای (رۆیاڵ دۆچ- شێل) لەژێر نفوزی سەرمایەی بەریتانیادا بوو، کۆمپانیاکانی نەوتی بەریتانیا زیاتر لە نیوەی (٥٢. ٥٪) ی سەرمایەی کۆمپانیاکەیان بەدەستەوە گرتبوو، هەربۆیەش بەسەر کۆمپانیای نەوتی عێراقدا زاڵ بوون. (د. عبدالرحمن قاسملو: کوردستان وکورد، و. عبدالله حسن زادە، ل٨٢).

١٨٧- د. محمد ازهر سعيد السماك وزكريا عبدالحميد باشا: إقتصاديات النفط والسياسة النفطية، ل٨٢.

١٨٨- هەمان سەرچاوە، ل٨؛ لەتیف فاتح فەرەج:کوردو کەرکوك، ب١، ل٨٩.

١٨٩- نجات كوثر اوغلو: صفحات من تاريخ كركوك منذ فجر التاريخ الي ١٩٥٨، ل١٧.

١٩٠- فوئاد حەمە رەشید: کەرکوك لەبەڵگە نامەکاندا، و. نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو، ل١١٢،

١٩١- ئەم بیرە نزیك شاری (دوبزە) و بەهاران بۆ سەیران رووی تێدەکەن، کەناوی بە نمرە هەشت لە نێوخەڵکدا دێت. (توێژەر)

١٩٢- فەرهاد هەمزە محەمەد: مێژوویی نەوتی کەرکوك، گۆڤاری بانە رۆژ، ژ(١١)، کانونی دووەمی ٢٠٠٥، ل٢٣.

١٩٣- د. عبدالرحمن قاسملو: کوردستان و کورد، و. عبدالله حسن زادە، ل٨١.

١٩٤- د. عبدالله غفور: جوگرافیای ئابووری نەفت لە کوردستاندا، چ٢، ل٧٢. ؛د. محمد ازهر سعيد السماك واخرون، جغرافية الموارد الطبيعية، جامعة الموصل، ل٨٩.

١٩٥- ئەم دوو هێڵە لە ساڵی ١٩٣٢ دا دروستکراون. (توێژەر).

١٩٦- لەتیف فاتح فەرەج: کوردوکەرکوك، ب١، ل٨٩.

١٩٧- كمال مجيد: نفگ الاكراد، ل٢٠.

١٩٨- فەیسەڵ عەلی: ئابووری نەوت لە کەرکوك، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژ(٤٠)، ساڵی سیازدەهەم، شوباتی ٢٠٠٣، ل٣٢٢.

١٩٩- د. عبدالله غەفور: جوگرافیای ئابووری نەفت لەکوردستاندا، چاپی دووەم، ل٦٥.

200- فەرهاد هەمزە محەمەد: مێژوویی نەوتی کەرکوك، چاپخانەی ئارابخا، کەرکوك، ٢٠٠٦، ل٣٢-٣٣.

٢٠١- حکمت سامي سليمان: نفط العراق، ل ١٦٩-١٧٠.

٢٠٢- دکتۆر موسەدەدەق١٨٧٩(-١٩٦٧)لە ساڵی ١٨٧٩ لە بنەماڵەیەکی نێودارو دەوڵەمەند لە دایك بووە، لە ساڵی ١٩٠٩ روودەکاتە ئەوروپا و دەست بە خوێندن دەکات لە بواری زانستی سیاسیدا، بەڵام بەهۆی نەخۆشییەوە وازدەهێنێت و دەگەڕێتەوە بۆ ئێران. پاشتر لە ساڵی ١٩١٤ بۆ جاری دووەم رووەکاتەوە ئەوروپاو دکتۆرای لە بواری رامیاری خوێندووە، موسەدەق لە ساڵی ١٩٤١ گەراوەتەوە ئێران. لە ٢٨ی نیسانی ١٩٥١دا پۆستی سەرۆك وەزیرانی ئێرانی وەرگرتووە، یەکەم کاری، بڕیاری خۆماڵیکردنی نەوتی ئێرانی دەرکرد. (جمال بابان: هەندی دادوەری بەناوبانگ لە مێژوودا یاخود محاکەماتی مەزن لە مێژوودا، چاپخانەی کۆری زانیاری عێراق، بغداد، ١٩٨١، ل١٩٢_١٩٣.، سپهر ذبیح:ایران در دوره دکتر مصدق، و. محمد رفیعی مهر ابادی، جلد دوم، چاپ سوم، موسسه انتشارات عطائي، تهران، ١٣٣٧، ل٤٨.، ناصر نجمی:دکتر مصدق برمسند حکومت، چاپ اسمان، تهران، ١٣٧٧، ل٣٦).

٢٠٣- فەرهاد هەمزە محەمەد: مێژوویی نەوتی کەرکوك، ل٣٣.

٢٠٤- جعفر عباس حميدي: التطورات والاتجاهات السياسة الداخلية في العراق ١٩٥٣-١٩٥٨، بغداد، ١٩٨٠، ل٢٤٨-٢٢٩.

٢٠٥- ليث عبدالحسن الزبيدي: ثورة تموز ١٩٥٨ في العراق، طبعة الثانية، منشورات مكتبة اليقظة العربية، بغداد، ١٩٨١، ل٤٩.

٢٠٦- جعفرعباس حميدي:التطورات والاتجاهات السياسة الداخلية في العراق ١٩٥٣-١٩٥٨، بغداد، ١٩٨٠، ل٢٢٩.

٢٠٧- نوری سەعید(١٨٨٧-١٩٥٨)نووری ناوی تەواوی (نووری کوری سەعید صالح کوری مەلا تەها قرەغۆلی)ە لە حیللە لە گەڕەکی (تپە الکرد) لە نزیك گۆڕەپانی مەیدان لەدایك بووە، سەبارەت بە بنەچەو رەگەزی نووری دەوترێت رەگەزی تێکەڵە لە (کورد و چەرکەس). چواردە جار پۆستی سەرۆکوەزیرانی لە ماوەی (١٩٣٠/٣/٢٣ تا ١٩٥٨/٥/١) وەرگرتووە و یەکێکە لە دیارترین سیاسیەکانی عێراق لە سەردەمی فەرمانڕەوایی پاشایەتییدا، لە ساڵ١٩٥٨دا کوژرا. (بروانە: حامد الحمداني: نوري السعيد رجل المهمات البريطانية الكبرى، مكتبة اليقظة العربية، بغداد، ١٩٨٩، ل١١و٢٨٣.، سيتون لويد: الرافدان (موجز تاريخ العراق منذ اقدم العصور حتى الان)، ت. طه باقر و بشير فرنيس، مندزات المتحق العربي، بغداد، ١٩٤٤، ل٢٦٧).

٢٠٨- حکمت سامي سليمان: نفط العراق، ل١٧٠.

٢٠٩- فەرهاد هەمزە محەمەد: مێژوویی نەوتی کەرکوك، ل٣٣-٣٤.

٢١٠- مەهدی محمد قادر: پێکهاتە سیاسیەکانی کوردستانی عێراق ١٩٤٥-١٩٥٨، ل١٥٨.

٢١١- حکمت سامی سلێمان: نفط العراق، ل١٥٨.

٢١٢- عەزیز شەمزینی:جووڵانەوەی رزگاریی نیشتمانیی

کوردستان، و. فەرید ئەسەسەرد، ل١٧.

٢١٣- حكمت سامي سليمان: نفط العراق، ل١٩٩.

٢١٤- د. كاوس قفطان: الحركة القومية التحررية الكردية في كردستان العراق ١٩٥٨-١٩٦٤، المديرية للطباعة والنشر، السليمانية، ٢٠٠٤، ل١١٦.

٢١٥- عەبدولقادر سالح: شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ لە عێراق، ل٣١.

٢١٦- فەرهاد هەمزە محەمەد: مێژووی نەوتی کەرکوك، ل٣٤.

٢١٧- ئەو یاسایە لە (١٢) خاڵدا باس لەو ڕێو شوێنانە دەکات، کە حکومەتی عێراق دەیگرێتە بەر بۆ چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ کۆمپانیا بیانییەکان، لە گرنگترین خاڵەکانی: ((ئەژمارکردنی تێچوونی دەرهێنانی نەوت و ئەوتوخمانەی لێی پێکدێت بۆ مسۆگەری مافی عێراق، ڕێگای دیاریکردنی نرخەکان، کە بەهۆیەوە داهاتی عێراق لەنەوت ئەژماردەکرێت، لابردنی ئەو داشکاندنانەی کە کۆمپانیاکان وەریاندەرگرت، دامەزراندنی بەڕێوەبەری عێراقی و بەشدارپێکردنیان لەئەنجوومەنی کۆمپانیاکان لەلەندن، دەستهەلگرتنی کۆمپانیاکان لەو زەوییانەی کە وەربەرهەمهێنانی تێیدا نەکراوە، بەمەبەستی سوود وەرگرتنی عێراق لێیان، وازهێنانی کۆمپانیاکان لەوگازە سروشتییەی کەلەپێویستیی کێڵگە نەوتییەکان زیادە، مسۆگەرکردنی بەکارهێنانی بارهەڵگری عێراقی بۆ گواستنەوەی نەوتی عێراق، پێویستیی بەشداری عێراق لەسەرمایەی کۆمپانیاکان بەرێژەیەك کەلە(٢٠٪)کەمتر نەبێت لە کۆی گشتی، پێویستە پشکی عێراق زیادبکرێت لەداهاتە نەوتییەکان)). (تارق کاکە ڕەش: بایەخی جیولۆجی نەوتی پارێزگای کەرکوك، لەبلاوکراوەکانی مەکتەبی بیرو هۆشیاریی (ی.ن.ك)، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل٣٩و ٧٩).

٢١٨- د. محمد سليمان حسن: نحو تأميم النفط العراقي، بيروت، ١٩٧٦، ل٩٠.

٢١٩- فەرهاد هەمزە محەمەد: مێژوویی نەوتی کەرکوك، ل٣٤.

٢٢٠- پرۆفیسۆر لۆکمان مهۆ: کوردو کوردستان لەبەڵگە نامە نهێنییەکانی ئەمریکادا(کوردستای عێراق)، و. وریا ڕەحمانی، ل٨٥-٨٦.

٢٢١- حكمت سامي سليمان: نفط العراق، ل٢١٠.

٢٢٢- الوقائع العراقية، رقم(١٤٤٩)، ١٧ آب ١٩٦٧.

٢٢٣- د. نووری تاڵەبانی: ناوچەی کەرکوك هەوڵی گۆڕینی باری نەتەوەیی ئەم ناوچەیە، و. محەمەد مەلا کەریم، ل٦٩.

٢٢٤- فەرهاد هەمزە محەمەد:مێژووی نەوتی کەرکوك، ل٣٤-٣٥.

٢٢٥- الجمهورية العراقية مديرية الاعلام العامة: النفط العراقي من منح الامتياز الى قرار التأميم، دار الحرية للطباعة، مطبعة الجمهورية، بغداد، ١٩٧٢، ل٦١.

٢٢٦- ماريون فاروق سلوغلت، بيتر سلوغلت: من الثورة الي الدكتاتورية العرق منذ ١٩٥٨، ت. مالك النبراسي، منشورات الجمل، ٢٠٠٣، ل١٩٦.

٢٢٧- الجمهورية العراقية مديرية الاعلام العامة: النفط العراقي من منح الامتياز الى قرار التأميم، دار الحرية للطباعة، مطبعة الجمهورية، بغداد، ١٩٧٢، ل٦١.

٢٢٨- خالد عبدالمنعم العاني: موسوعة العراق الحديث، المجلد الثاني، الدار العربية للموسوعات، بغداد، ١٩٧٧، ل٥٣٢.

٢٢٩- ماريون فاروق سلوغلت، بيتر سلوغلت: من الثورة الى الدكتاتورية العراق منذ ١٩٥٨، ت. مالك النبراسي، ل١٩٧.

٢٣٠-بڕوانە: فەرهاد هەمزە محەمەد: مێژووی نەوتی کەرکوك، ل٣٥.

٢٣١- پ. د. شوکریە ڕەسول: بارزانی و کێشەی کورد لەنێوان بەرژەوەندی دەوڵەتە زلهێزەکان و دەوڵەتانی ناوچەییدا(١٩٤٥-١٩٧٥) کۆنگرەی یادەوەری سەد ساڵەی بارزانی نەمر، هەولێر، ٢٠٠٣، ل٤٠٩.

٢٣٢- فەرهاد هەمزە محەمەد: مێژووی نەوتی کەرکوك، ل٣٥.

٢٣٣- هەمان سەرچاوە، ل٣٦.

٢٣٤- ماريون فاروق سلوغلت، بيتر سلوغلت: من الثورة الى الدكتاتورية العراق منذ ١٩٥٨، ت. مالك النبراسي، ل١٩٨.

٢٣٥- اديث واثلي، ايف، بيزوز: العراق دراسة في العلاقات الخارجية ١٩١٥-١٩٧٥، ت. عبدالمجيد حسيب القيسي، الطبعة الثاني، بدون مكان طبع، ١٩٨٩، ل١٩٨.

٢٣٦- دۆستایەتی وپێوەندیی پتەوی نێوان عێراق و سۆڤێت و لەولاشەوە توندگرێدانی مستەفابارزانی بەئێران و ئەمریکاوە، وایکردبوو کە زیاتر درزبکەوێتە نێوان پێوندییەکانی سۆڤێت و شۆڕشی کوردەوەو ڕاستوخۆ ببنە نەیاری یەکتری. (کەمالی عەلی و سەروەر عبدالرحمن عمر: هەولویستی ولاتانی دەرەوە، ل٢٣).

٢٣٧- اديث وائي، ايف، بيروز: العراق دراسة في علاقات الخارجية ١٩١٥-١٩٧٥، ت. عبدالمجيد حسيب القيسي، ل١٩٨.

٢٣٨- پ. د. شوکریە ڕەسوڵ: بارزانی و کێشەی کورد لەنێوان بەرژەوەندیی دەوڵەتە زلهێزەکان و دەوڵەتانی ناوچەییدا(١٩٤٥-١٩٧٥)، ل٤٠٥.

٢٣٩- نازناز محمد عبدالقادر: سیاسەتی ئێران بەرامبەر بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە کوردستانی عێراقدا(١٩٦١-١٩٧٥)، ل١٨٥.

٢٤٠- فەرهاد هەمزە محەمەد: مێژووی نەوتی کەرکوك، ل٣٥-٣٦.

٢٤١- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ماريون فاروق سلوغلت، بيتر سلوغلت: من الثورة الى الدكتاتورية العرق منذ ١٩٥٨، ت. مالك النبراسي، ل١٩٧-١٩٩.

٢٤٢- الجمهورية العراقية مديرية الاعلام العامة: النفط العراقي من منح الامتياز الى قرار التأميم، ل٦٧-٦٨.

٢٤٣- فەرهاد هەمزە محەمەد: مێژوویی نەوتی کەرکوك، ل٣٧.

٢٤٤- د. مكرم طالباني: مراحل تطور الحركة القومية الكردية، المجلد الأول، ل٣٢١-٣٢٢.

٢٤٥- وەرگیراوە لە: الجمهورية العراقية مديرية الاعلام العامة: النفط العراقي من منح الامتياز الى قرار التأميم، ل٧٢-٧٣.

٢٤٦- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی - عێراق: ڕاپۆرتی سیاسی سەربەهەشتەمین کۆنگرەی هەرێمایەتی، کانوونی دووەمی ١٩٧٤، دار الحريه للگباعه، بغداد، ١٩٧٧، ل٨٦-٨٨.

٢٤٧- یاسای خۆماڵیکردنی نەوتی عێراقی سنووردار ژمارە(٦٩) بۆ ساڵی ١٩٧٢ بریتی یە لەمادەی یەکەم:پرۆسەکانی کۆمپانیەی نەوتی عێراقی سنووردار، خۆماڵی دەکرێ لە شوێنەکانی کە بۆی دەستنیشان کراوە، بەپێی یاسای ژمارە(٨٠) ی ساڵی ١٩٦١، و مولکیەتی هەموو ماڵ و ماف هەیەتی دەبنە هی دەوڵەت کەوا بەستەن بەپرۆسەی نێوبراو. ئەوە، بەتایبەتی ئەو شتانە دەگرێتەوە بیناکراوەکان و دەزگای پشکنین وهەڵکۆڵین و بەرهەمی نەوتی خاو وگاز و تاتوی کردن و کۆکردنەوە و پەمپکردن و گواستنەوە و پارزن و عەنبارکردن و هێڵەکانی بۆریەکانی سەرەکی ومەیدانی وهەرشتێکی دیکە ولەنێوایاندا بیرۆی کۆمپانیای نێوبراو لەبەغداد بەهەموو بیناو کەرەستەکانیان. مادەی دووەم: بەپێی ئەو یاسایە کۆمپانیەکی دەوڵەتی بەناوی کۆمپانیەی عێراق بۆ کاروباری نەوتی دروستدەکرێ و لەگەڵ دروستکردنیدا بەهەبوون دادەندری و هەموو ماڵ و ماف کۆمپانیەکە دەدری بەو کۆمپانیە کە مولکایەتیان بوونەتە هی دەوڵەت بەپێی مادەی یەکەم لەو یاسایەدا کۆمپانیەکە لەسەرکانەکانی پێشووی کە پێوەندیان بەپرۆسەی خۆماڵیکردن هەیە ناکات، تەنیا لە سنووری ئەوانەی کەدراون بەدەوڵەت لەماف و ماڵ و شتومەکدا. مادەی سێیەم: دەوڵەت قەرەبۆی بە کۆمپانیەی نەوتی عێراقی سنووردار دەدات، لەجیاتی ئەوشتانەی کەبوونەتە هی دەوڵەت بەپێی مادەی یەکەم لەماڵ و ماف و شتومەك، بەمەرجێك لەو قەرەبویە ئەوەندە پارەی پێویستە بۆدانەوەی باج و تاریفی و حەقدەست و هەر پارەیەکی دیکە کە پێوەندی بەخاڵەکانی پێشووەوە هەیە و دیاریکردنی چۆنییەتی قەرەبۆو چۆنییەتی شکاندنی و ئەوەی بۆ ئەو پێویستە بەپێی یاسا، دەبێت بدرێت. (وەرگیراوە لە: عەبدوڵڵا غەفور: جوگرافیای ئابووری نەفت لە کوردستاندا، ل٥٦-٥٧).

٢٤٨- بڕوانە: الوقائع العراقية، عدد(٢١٤٦)، ١٩٧٦/٦/١.، الجمهورية العراقية مديرية الاعلام العامة: النفط العراقي من منح الامتياز الى قرار التأميم، ل٧٤-٨٤.

٢٤٩- بەپێی یاسای ژمارە(٧٠)ی ساڵی ١٩٧٣ نەوتی بەسرا ی ئەمریکاخۆماڵیکراو بەپێی یاسای ژمارە(٩٠)ی ساڵی ١٩٧٤نەوتی بەسرا لە هۆڵەندا سەندرایەوە، دواتر بەپێی یاسای ژمارە(٢٠٠)ی ساڵی (١٩٧٥)ش تەواوی نەوتی بەسرا خۆماڵیکرا. (حكمت سامي سليمان: نفط العراق، ل٢١٣).

٢٥٠- کەندال و عەبدولرەحمان قاسملو و ئەوانی تر: گەلێکی پەژموردەو نیشتمانیی پەرت(کوردو کوردستان)، و. م. گۆمەیی، ل٢٩٨-٢٩٩.

٢٥١- پارتی دیموکراتی کوردستان- مەکتەبی سیاسی - مەکتەبی ناوەندیی دیراسات و توێژینەوە: نەوتی کوردستانی عێراق (توێژینەوەیەکی مێژوویی، جیۆلۆجی، جوگراف، وئابووریە)، بەشی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٧، ل٢٣.

٢٥٢- لەتیف فاتح فەرەج: کوردو کەرکوك، ب١، ل٩٦.

٢٥٣- ئا:ئازاد سەراوی:بەرەوکەرکوك، ب١، ل٢٦٢.

٢٥٤- گۆڤاری کادر، ژمارە(١٦)، ئەیلوولی ١٩٧٢، ل٢٥.

255- Nader Entessar:Kurdish Ethnonationalism,p. 75.

٢٥٦- (ئەمین قادر مینە: ئەمنی ستراتیجی ی عێراق و سیکۆچکەی بەعسییان(تەرحیل، تەعریب، تەبعیس)، ل١٨٥.

٢٥٧- سەروەر عبدالرحمن عمر: یەکێتی نیشتمانی کوردستان ١٩٧٥-١٩٧٦، ل٦٤-٦٥.

٢٥٨- فوئاد حمه خورشید: کەرکوك لەبەڵگەنامەکاندا، و. نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو، ل٦٠.

٢٥٩- عەلی محمود محەمەد:کەرکوك شاری قەڵاو ئاگر و خوێن، ل٢٠٩.

٢٦٠- فوئاد حمه خورشید: کەرکوك لەبەڵگەنامەکاندا، و. نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو، ل١٥٨.

٢٦١- بۆزانیاری زیاتر لەسەر گۆڕانکاری کرێکاران، بڕوانە خشتەی ژمارە(١).

٢٦٢- سنوور سەباح سدیق: مێژوویی سیاسەتی بەعەرەبکردن لە پارێزگای کەرکوك ١٩٦٣-١٩٩١، ل٩٨.

٢٦٣- پاش دەکردنی کورد لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك حکومەتی بەعس دەستیکرد بەدەکردنی تورکمانەکانی کۆمپانیاکە:(د. نووری تاڵەبانی: ناوچەی کەرکوك هەولی گۆڕینی باری نەتەوەیی ئەم ناوچەیە، و. محەمەد مەلا کەریم، ل٤١).

264- چاوپێکەوتن لەگەڵ(مامۆستا بێستوون عەلی کەریم)، سلێمانی، ڕۆژی پێنجشەممە، ٢٠١٠/٣/٢٥.

٢٦٥- چاوپێکەوتن لەگەڵ(ئیسماعیل حەیدەر عەلی)، سلێمانی، یەکشەممە، ٢٠١٠/١/٢٤.

٢٦٦- التآخي، العدد(١٣١٤)، ١٩٧٣/٨/١٩.

٢٦٧- چاوپێکەوتن لەگەڵ(ئیسماعیل حەیدەر عەلی)، سلێمانی، یەکشەممە، ٢٠١٠/١/٢٤.

٢٦٨- فەرهاد هەمزە محەمەد: مێژووی نەوتی کەرکوك، ل٧٤-٧٥.

٢٦٩- سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٣.

٢٧٠- ئازاد: هێڵەکانی ستراتیجی و ڕووتاندنەوەی بەرفراونی سامانی نەوتی کوردستان لە کەرکوك, گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(٢-٣)، پاییزی ١٩٩٩ و زستانی ٢٠٠٠، ل٨١-٨٢.

٢٧١- پارتی دیموکراتی کوردستان- مەکتەبی سیاسی - مەکتەبی ناوەندیی دیراسات و توێژینەوە: نەوتی کوردستانی عێراق، بەشی یەکەم، ل٧٢.

272- بڕوانە: حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی - عێراق:ڕاپۆرتی سیاسی سەربەهەشتەمین کۆنگرەی هەرێمایەتی، کانوونی دووەمی ١٩٧٤، ل .

٢٧٣- پارتی دیموکراتی کوردستان- مەکتەبی سیاسی - مەکتەبی ناوەندیی دیراسات و توێژینەوە: نەوتی کوردستانی عێراق، بەشی یەکەم، ل٧٢. ؛ محەمەد سەعیدسۆفی: پارێزگای کەرکوك لەناوپاکتاوکردنی رەگەزییدا، ل١٧.
٢٧٤- لەتیف فاتح فەرەج: کوردو کەرکوك، ب١، ل٨٧-٨٨.
٢٧٥- حکومەتی بەعس بەردەوام سەرقاڵی رێکخستنەوەی سوپا بوو، بەشێوەیەکی فروان مەشقی سەربازیی دەکرد، پاش رێککەوتنی لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت، کەوتە وەرگرتنی چەك و تەقەمەنی نوێ لە تانك و زریپۆش و تۆپی دوورهاوێژو فرۆکەی جەنگی. (ئاری کەریم: چەند لاپەرەیەکی زیندوو لە شۆرشی ئەیلوول، ل١٧٤-١٧٥).
٢٧٦- پارتی دیموکراتی کوردستان(سەرکردایەتیی کاتی): رێبازی بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد هەڵسەنگاندنی شۆرشی ئەیلوول و بەرنامەی نوێی پارتی دیموکراتی کوردستان، راپۆرتی سیاسی سەرکردایەتیی کاتی پارتی دیموکراتی کوردستان، کەلەلایەن کۆنفراسی پارتی یەوە لە(١١-١٥)ی ئابی ١٩٧٦ پەسەنکراوە، ل٦٣.
٢٧٧- ولیام ئەندەرسن و کایپ ستانسفێلد:ئایندەی عێراق، دیکتاتۆری، دیموکراسی یان دابەشبوون؟، و. کامیار سابیر و دڵشاد حەمە، چاپخانەی رەنج، ٢٠٠٨، ل٩٩-١٠٠.

*** داستانی لێدانی (نەوتی) کەرکوك لە ساڵی (١٩٦٩)**

**وەسفی حەسەن**

**ماوەیەکی زۆر بوو سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە دەستێکی گەورەو بەهێز لە دەزگاکانی نەوتی کەرکوك بوەشێنێت، لە سەرەتادا چەند هەوڵێکی سادەو بچووکی کرد، بەڵام هیچ ئەنجامێکی گەورەی نەبوو، وەزیانی نەدا لە دەزگا نەوتییەکانی کەرکوك. لە ساڵی (١٩٦٨)ەوە بۆ ماوەی ساڵێك لێکۆڵینەوەو شرۆڤەی پێویست کرا بۆ ئەوەی نەخشە رێگەیەکی پێویست بەجێبهێنن تا لە کاتی پێویست لە دەزگا نەوتییەکانی بدەن لە سەرەتادا هەریەکە لە سامی عەبدولرەحمان، فاخیر مێرگەسووری، سامی عادل ئاکرەیی، موعین دەمە قوتانی کەرکوکی، بە نەهێنی وەکو رووکاری پێویستی خۆیان کرد بۆ دۆزینەوەی نەخشەی پێویست بۆ لێدانی دەزگا نەوتییەکان. سەرەئەنجام رابەرانی کورد بریار دەدەن داموەزگای کۆمپانیایی نەوتی عێراق بتەقێننەوە، بەڵام رادەی زیانەکە لە سنوورێکی دیاریکراودا بێت، هەڵبەت مەبەست لەم هێرشە بۆ سەر کەرکوك وێرانکردنی دەزگا نەوتییەکان نەبوو، بەڵکو گەیاندنی پەیامێك بوو، تا کاربەدەستانی بەغدا بزانن کە ئەگەر هەر سووربن لەسەر ئەوەی بە پارەی نەوت چەك بکڕن ئەوا سەرچاوەی دەرامەتەکەیان کە لەم سەرووبەندانەدا مانگانە دەگەیە دە ملیۆن دۆلار، دەکەوێتە مەترسییەوە.**

**بۆ ئەوەی داستانەکە بەشێوەیەکی سەرکەوتوو بگاتە ئەنجام، ئەم کارە سپێردرا بە هێزی (هەڵگورد)و بەسەرپەرشتی (٢٥٠) پێشمەرگەی هێزی (رزگاری) بۆ کۆنترۆل کردنی رێگای (کەرکوك-شوان)، (کەرکوك-ئالتون کۆپری)، (یارەلی -رەحیماوا-بارووتخانە)، (سەقزلی-شوان-تەق تەق)، (ستاپ لانی-رەحیماوا-کەلی سێکانیان) تا بۆ ئەوەی لەکاتی کشانەوەدا بە شێوەیەکی سەرکەوتووو بێ زیان بە ئەنجام بگات.**

**هەریەکە لە سەرلقەکانی پێشمەرگە، بەهجەت تۆرکە، ناژم حەمەی سلێمان، کۆیخا جەوهەر تلیانی، فەقێ حەمە ئەمین، سەعید تۆماری، عەریف خالد، نەسرەدین مستەفا، سەرپەرشتی و کۆنترۆلی رێگاکان بکەن لە کاتی هێرشدا.**

**هەروەها (٢٥) تۆپچی هێزی هەڵگورد، لەگەڵ چەند دۆشکەیەك لە هێزی هەڵگوردو هێزی پێشمەرگەی پیادە لەگەڵ فاخیر مێرگەسووریو عەریف دەرۆیش چوونە کەلی سێکانیان بۆ ئامادەیی هێرشکردن.**

**لە هەمان کاتدا هێزی دەشتی هەولێر هاتبوو بە سەرپەرشتی (فارس باوە)و جێگرەکەی (سابیر شێخ جامی) بۆ کاتی پێویست ئەگەر هاتوو داستانەکە هەرەسی هێناو سەری نەگرت، ئەمان وەکو هێزی بەرگری هێزی هەڵگورد پشتیوانیان بن لە کاتی تەنگانەدا.**

**لە کاتی گەیشتنی پێنج تۆپی هێزی هەڵگورد (دوو لە جۆری ١٠٦ ملم و سێ لە جۆری ١٢٠ملم) گەیشتنە کەلی سێکانیانو پێگەی خۆیان قایم کرد، لە سەعات نۆو نیوی شەو لە شەوی (١)ی ئاداری ساڵی (١٩٦٩)، بریاری لێدانی دەزگا نەوتییەکانی کەرکوك درا.**

**تۆپچییەکانی هەڵگورد لە سەرەتادا سێ تۆپیان بەکارهێناو دووانەکەی تریان وەکو یەدەك لەبەر دەستی خۆیان هێڵایەوە. لە سەرەتا هەر سێ تۆپەکە نزیکەی (٥٠) تۆپیان دا لە کۆمپانیای نەوتی عێراق بە تایبەتی لە (معمل الترکیز یونیتی واتا یەکەی ١٢) و ئاگر لەو شوێنانە بەرزبووەو شەویان کرد بە رۆژ.**

**بەراستی ئەم دارستانە لەو رۆژەدا، کارێکی سەختو مەزن بوو، کارەکەیان بە جورئەتو مێرخاسی بوو، ئەم کارە دەنگدانەوەیەکی ناوخۆییو نێودەوڵەتی مەزنی هەبوو، کە رەنگدانەوەی کاریگەری خۆی هەبوو لەو کاتەدا، حکومەتی بەعس هەوڵیدەدا لە راگەیاندنەکاندا پەردەپۆشی بکات.**

*** سەرچاوە:-**

**- داستانالێدانا گازخانا کەرکوك ل ١٩٦٩/٣/١، وەسفی حەسەن، دەزگای موکریانی، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠١٠، لاپەرەی جۆراو جۆر.**

*** ئەنفال، پرۆسەیەکی بەدناو:-**

کورد یەکێکە لەو نەتەوانەی رۆژهەڵاتی ناوەراست، خاوەنی مێژوویەکی دووروودرێژە لە خەبات و تێکۆشان و تاکە نەتەوەیە لە رۆژهەڵاتدا، خاوەنی ماف چارەی خۆنووسی خۆی نییە و لە چوارچێوەی دەوڵەتە جیاجیاکاندا دابەشکراوە و لە هەموو مافێکی ژیان بێبەشکراوە.

کورد لەپێناو بەدەستهێنانی مافەکانیدا هەردەم لە خەبات و تێکۆشاندا بووە و چیاو بست بەبستی ئەم خاکەی کوردستان هاوڕێ و پاڵپشتی بووە لە تەنگانەداو تەنها پیرۆزی خاکەکەی و خەڵکە ستەمدیدەکەی داکۆکیکەری راستەقینەی ئەم کوردستانە بووە. بەدرێژایی مێژووی ئەم گەلە ستەمدیدەیە هەردەم بەرگریکەری راستەقینە بوو لە خاکی ئەم کوردستانە.

دووژمنی پارچەکانی کوردستان بە هەموو جۆرێك هەوڵیانداوە خاکی ئەم وڵاتە و گەلەکەی بە هەموو جۆرێك بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە و هەموو رێگایەکیان بەکارهێناوە لەپێناو سەرکووتکردنی ئەم گەلە خاك دابەشکراوەدا.

بەدرێژایی مێژووی کوردستان و دووژمنەکانی، ئەوانەی وا لەسەر خاکی کوردستاندا ململانێ و بەربەرەکانییان بوو، لەپێناو بە خوێنکردنی هەموو پارچەکانی کوردستان، بۆ ئەوەی بتوانن مەرامە گڵاوەکانیان جێبەجێ بکەن.

لە درێژایی مێژووی خوێناوی دووژمنە یەك لە دوایەکەکانی کوردستان، زنجیرەیەك مێژووی خوێناوی و دڵ تێنوومان بۆ بەجێ ماوە کە گەواهی راستی ئەو تاوانە دەخەنە روو کە دەرهەق بە گەلی کورد کراوە لەلایەن دووژمنەکانییەوە، لە سووتاندنی خاکی کوردستان و راگواستن و کاولکردن و خاپوورو تەعریب و تەتریك و تەفریس و شێواندنی دیمۆگرافیای کوردستان، ئەویش لە چوارچێوەی لە ناودان و راوەدوونانی خەڵکەکەی.

ئەم مێژووە خوێناوییانە دەرهاویشتەی کۆمەڵێك کاردانەوەو کاریگەری کۆمەڵایەتی و ئایینی وئابووری و سەربازی و رۆشنبیری و سیاسی خۆی هەبووە، کە بە درێژایی مێژوو کاریگەری بەسەر خاکی کوردستانەوە بەجێ هێشتووە.

ئەم کاریگەرییانەش بەپێی رۆژگارو قۆناغە مێژووییەکان، جیاوازی هەبووەو دەوری بینیوە لە شێواندنی مێژوو کەسایەتی کوردو هەردەم خودی کەسەکانی کوردی لە بارێکی ناجێگیردا پێگەیاندووە کە لە قۆناغەکانی لەوەو دوای ئەو کاریگەرییە دەرهاویشتەی شێواندن و سرینەوەی شوێنەوارو کەلەپووری کورد بووە، کە رۆژگار ئەوەی سەلماندووە، پارچەکانی کوردستان بە درێژایی مێژوو داگیرکراوەو خەڵکەکەشی نامۆ کراوە لێی و بۆتە کەسێکی بێگانەو نەشارەزای وڵاتی خۆی و بەو شێوەیە گۆشکراوە کە لە رۆشنبیری دووژمنەکانییەوە سەرچاوەی گرتووە.

میللەتی کورد لە ماوەی سەدەی رابردوودا تووشی گەلێك کارەساتی مرۆڤایەتی و مرۆیی بووە، بەتایبەتی لەو شوێنانەی کە بەرپارچەی دەوڵەتە جۆربە جۆرەکان کەوتووە، بەتایبەتی لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، بووە هۆکاری هەڵتەکاندن و لووشدانی مافەکانی مرۆڤ وبەشێکی زۆری ئەو کارەساتانە بەر کوردستانی باشوور کەوتووە، ئەویش بە رێگای راگواستن و تەعریب و لە ناودانی بە کۆمەڵ و کوشتن و برینی جۆراو جۆر.

دەوڵەتی عوسمانی سیاسەت و رێگای جۆر بەجۆری بەکاردەهێنا لەپێناو دەستبەسەراگرتنی ئیمارەتە کوردییەکان، ئەویش بە بەکارهێنانی رێگای شەر بە شەری کوردو بێهێزکردنی لە پاڵ بەکارهێنانی هێرشی جۆراوجۆرو کۆمەڵکوژی گەورە گەورە لە کورد، نموونەمان گەلێك زۆرە لە هەموو پارچەکانی ژێر رکێفی دەوڵەتی عوسمانیدا، وەك ئەوەی بەسەر بابان و ئیمارەتی زەنگنە و سۆران و ئەردەڵانیان هێنا و خەڵکەکەیان راگوێستی شوێنە دوور دەستەکانی ئیمپراتۆریەتەکە کردووە لەپێناو دەسبەسەراگرتنی زەوی و زارو سووتاندنی رەزو باخ و کشتوکاڵ و زەوی کێڵراویان، هەروەك نموونەیەکی دیکەی کۆمەڵکوژی دەوڵەتی عوسمانی، وەکو قەتڵ و عامی کوردو ئەرمەن و جوولەکەو نەتەوەکانی تر.

ئەم سیاسەتەی عوسمانییەکان هەمان سیاسەتی دەوڵەتی تورکیای تازەبوو کە بە هەمان رێچکەو رێباز پەرەیان بە سیاسەتی تەتریککردنی خۆیاندا لە ناوچە کوردنشینەکان، نموونەی ئەم کۆمەڵکوژییە لە دەرسیم بە شێوەیەکی فراوان جێبەجێکرا.

دەوڵەتی ئێراقی تا رووخاندنی بەعس، کورد لە ماوەی مێژووی فەرمانرەوایی ئەو حکومەتانەدا، تووشی گەلێك کارەسات و تەعریب و سووتاندن و دەربەدەربوون هاتووە، گەورەترین و زەقترینیان راگواستن و خاپوورکردنی کوردستان خۆی بینییەوە، بریتی بوو لە پرۆسەی بەدناوی ئەنفال، کە ئامانج و ستراتیژی بەعس خۆی دەبینێتەوە لە سیاسەتێکی درێژخایەن، لەپێناو بەجێ گەیاندنی ئامانجەکانی لە تاڵان و کووشتن و برین و کۆمەڵکوژی و سووتاندنی خاکی کوردستان، بۆیە پرۆسەیەکی بەدناو و درێژخایەنی قۆناغ بە قۆناغ بوو کە توانی دەرامەتێکی زەبەلاح و قەبەی بۆ دیاری بکات لەپێناو سەرگرتنی ئەم پرۆسەیەدا.

لێرەدا دەگەینە ئەو راستییە ئەنفال ستراتیژێکی گەورەی بەعس بوو لەپێناو بەعەرەبکردنی هەموو کوردستان کە بیروباوەرو پرۆگرامی حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی لەسەر بەرجەستەکرا بوو.

ئەنفال بەکارهێنانی ناوێکی دیاری کراوو مەبەستداربووە، هەوڵی داوە لەو چوارچێوەیەدا بەکاری بهێنێت بۆ ئەوەی کاریگەرییەکی ئایینی و زمانەوانی و دەمارگیری نەتەوەیی عەرەبی پێوە دیاربێت.

رژێمی بەعسی لەناوچوو لە ستراتیژێکی درێژخایەنەوە کاری کردووە، لەپێناو بەکارهێنانی ناوی ئەنفال و چۆنییەتی بێژەتکردن و بنەرەتی دروستبوونی ناوەکە بۆ رووبەکی مێژوویی، بۆیە دەبینین هەڵبژاردنی ناوەکەی هاوپەیوەستی

ئەو ووشەیە بووە کە لە قورئانی پیرۆزدا دەورو ڕێسای تایبەتی خۆی هەبووەو، هاودەنگی یەکێ لە سورەتەکانی قورئان بووە کە هەولی داوە هاوگونجاوییەك دروست بکات لەنێوان ناوەرۆکی ئەنفال لە قورئان و قەتل عامکردنی کورد لەلایەکی تر.

سورەتی ئەنفال سورەتی هەشتەمە لە دوای سورەتی بەقەرە کە ژمارەی ئایەتەکانی (٧٥) ئایەتە.

لێرەدا گرێدانی عاتیفەی ئایینی و نەتەوەیی دەوری بینی لە بەکارهێنانی ووشەی ئەنفال بۆ پرۆسەکە.

ئەنفال پرۆسەیەکی نەخشە بۆ کێشراوو بەرنامە بۆ دارێژراو بوو، یەکێك بوو لە خاڵە بنەرەتی و ستراتیژییەکانی ڕژێمی بەعس، بۆ لەناوبردنی بەکۆمەڵی نەتەوەی کوردو برانەوەی ڕەچەڵەکی مرۆڤی کورد لە کوردستانی باشوور بۆ شێواندنی سروشتی نیشتمانەکەی لە رووی جوگرافی و دیموگرافی و کەلتوورییەوەو برانەوەی مەترسی سەرهەڵدانەوەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد بۆ هەتا هەتایە.. ئەنفال تەنیا پرۆسەی جینۆسایدکردنی و قری مرۆڤی کورد نەبوو، بەڵکو ئەزموونێکی (سی) ساڵەی بەرنامە دارێژراو بوو لەسەر نەخشەیەکی بەربڵاو بۆ لە ناوبردن و توانەوەی ڕەچەڵەکی کوردو گۆرینی ڕەگەزی کوردبە عەرەب و شێواندنی جوگرافیا و دیموگرافی کوردستان.

ئەم پرۆسەیە بەپێی هەل و مەرجە دژوارو تایبەتییەکان گۆرانی بەسەردا هاتووەو بە چەندین تاکتیك و قۆناغی جیاوازدا تێپەڕیوە.

دووژمنەکانی کورد تەنیا توانیان سەرەتاکانی پرۆسەی ئەنفال جێبەجێ بکەن، بەڵام ڕووداوەکانی ناوچەکەو گۆڕانە جیهانییەکان بوونە کۆسپ لە جێبەجێ گەیاندنی بەشە گرنگ و کۆتاییەکانی ئەنفال.

پرۆسەی ئەنفال لە فیکری بەعسدا لە کۆنەوە نەخشەی بۆ داڕێژاوە، سیاسەتمەدارەکانی پێش سەدام بەشێك لەو بەرنامەیەیان جێبەجێ کردووە، بەڵام دیکتاتۆری سەدام لە هەموویان زیاتر پیادەی کرد، بەناوبانگترین و دیارترینیان کۆمەڵکوژی گەرمیان و بادینان و هەڵەبجە بوو، پرۆسەی ئەنفال لە پێش ئەم شوێنانەشدا لە چەند کات و شوێن و سەردەمی جیاوازدا، کەم تا زۆر هەوڵی بۆدرابوو، بەشێکی بچووکیش لەو پرۆسەیە لە جێبەجێکردندا بوو. ئەنفال جێبەجێکردنی پرۆسەی کۆمەڵ کوشتنی خەڵکانی خاوەن هەڵوێست و شۆڕشگێڕو کەسانی سادەی کۆمەڵگای کوردی بووە.

پرۆسەی ئەنفال بە شێوازو رێگای جۆراوجۆر کارەکانی خۆی جێبەجێ کردووە، لە شێوەی ئەنفالی تاك و تەراو سەرنگوتکردن و ئەنفالی کۆمەڵکوژی و ئەنفالی کیمیاباران و ئەنفالی راگواستن و سووتاندن.

لە ساڵی (١٩٨٨)دا ئەنفال سەراپا ناوچە ئازادکراوەکانی گرتەوە، ئەو ناوچانەی کە لەژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگەو شۆڕشدا بوون کە (دۆڵی جافایەتی، شارباژێر مەرگە، پشدەر، قەرەداغ و تەواوی گەرمیان، شارەزوور، هەورامان، پێنجوێن، گۆپتەپەو عەسکەر، دەشتی هەولێر، بالیسان، باڵەکایەتی و بادینانی گرتەوە.

ئەم پرۆسەیە گەورەترین و سامناکترین شێوەی ئەنفال بوو، هێزی پێشمەرگە گەرچی لەتوانابوو بەرگری کرد لە شەرێکی بەرەیی فراوان لەگەڵ سوپای عێراق کە ئەزموونی هەشت ساڵی شەری ئێرانی هەبوو، چارەکە ملیۆنێك مرۆڤی کورد بێ سەرو شوێن کران. ئەنفالی یەك لە دۆڵی جافایەتی و مەرگە لە رۆژی (٢١ی شوبات تا هەژدەی ئاداری ١٩٨٨) دەستی پێکرد.

سووپای دووژمن بۆ یەکەمجار بە پاڵپشتی تانك و زرێپۆش و تۆپی (١٧٥ ملم و ١٣٠ ملم) کاتیۆشای (١٣٢ملم) و فرۆکەی جەنگی و هەلیکۆپتەر، دەستی پێکرد هێرشێکی تووندیان کردە سەر دۆڵی جافایەتی بەمەبەستی گرتنی چەند بارەگایەکی گرنگ لەوانە سەرگەلو کە مەڵبەندی دووی لێبوو، بەرگەلو کە بارەگای مەکتەبی سیاسی و نەخۆشخانەی شۆڕش و دەزگای راگەیاندن و ئێستگەی دەنگی گەلی کوردستانی لێبوو.

شەرێکی بەرەیی فراوانی نا بەرامبەر بە درێژایی حەفتا کیلۆمەتر بەرپابوو، لیوا روکن سولتان هاشم ئەحمەد سەرپەرشتی فەیلەقی یەك و پێنج و بیست لیوای فەیلەقەکانی (٧، ٦، ٥، ٤، ٣، ٢) و لیوای هێزی تایبەتی (٦٥، ٦٦)ی سەرکردایەتی گشتی هێزی چەکدار، لیوای مغاویری فەیلەقی (٢، ٤، ٦) و لیوای (٧٥ن ٧٢، ٣١، ١٩، ٤٤٥، ٤٣٨، ١١٦)ی فەوجی مەغاویری فەیلەقی (٤، ٥)ی دەکرد، جگە لە مانەش نزیکەی (٣٠ فەوجی موالیدی ١٩٤٥) لەگەڵ تەواوی سریەو فەوجە سووکەکانی کوردستاندا بەشدار بوون ئەم سوپا زەبەلاحە چەندان تەن گازی ژەهری تابون و خەردەلیان هەڵرشت بەسەر سەنگەرەکانی پێشمەرگەو گوندەکان و ناوچە ئازادکراوەکاندا.

لە ئەنفالی دووشدا، لە شەوی ٢٢ لە سەر ٢٣ی مانگی ئادار، دووژمن بە هێزێکی زەبەلاح و چەکی قورسەوە لە چەند قۆڵێکەوە بە سەرپەرشتی لیوا روکن ئەیاد خەلیل زەکی، هێرشیان کردە سەر ناوچەکانی بازیان، تەینال، دەربەندیخان، قەرەداغ، ئەو سەردەمە مەڵبەندی یەك لە قەرەداغ بوو.

لە سەنگاوەوە هێرشیان کرد بۆ هەنارە، کانی باچکە، جافەران، قەرەداغ، ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە خەڵکی سێوسێنان بەگازی ژەهری کیمیاوی گیانیان لە دەستداو بریندار بوون، سامانی ئاژەڵی و کشتوکاڵیان تاڵانکراو سوتێنرا.

لە سی و یەکی مانگی ئادار تا هەژدەی نیسانی هەمان ساڵ، ئەنفالی سێ سەرتاپای گەرمیانی گرتەوە.

سوپای ئەنفال بە سەرپەرشتی عەلی حەسەن مەجیدو عەمید روکن بارق عەبدوڵڵا حاجی خستەلە، چەندان سنووری جیاجیاوە هێرشی گەورەیان کردە سەر ناوچەی گەرمیان و ناوچەیەکی بەفراوانی وەکو چەمچەماڵ، سەنگاو، لەیلان، قادر کەرەم، نەوجول، خورماتوو، کفری سەرقەڵا، جەبارە، کەلار، باوەنوور، تیلەکۆ، دەربەندیخانی گرتەوەو بازنەیەکی گەورەی سەربازییان بە دەوری گەرمیاندا تەنی.

لە ناوچەی گەرمیاندا لەسەدا سەدی پرۆسەکەی

جێبەجێ کردو نزیکەی (١٠٠٠) گوندی بە تەواوەتی خاپوورو کاولکردن‌و تاك، تاك خەڵکەکەی ڕزگاریان بوو.

لە بیستی نیسان بۆ پێنجی مایسی هەمان ساڵ، ئەنفالی چوار جێبەجێ کرا بۆ سەر ناوچەکانی ئاغجەلەر، چەمی ڕێزان، دەشتی کۆیە، تەقتەق قەرەهەنجیر، هەروەها هەستا بە کیمیابارانکردنی گۆپتەپە، عەسکەر، مایلە، سەچما، شێخان کەلەشێرە، چەمی ڕێزان، قۆچە بلاخ، زەرزێ.. کە بووە شەهیدو بریندار کردنی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ناوچەکە.

لە ئەنفالی پێنج‌و شەش‌و حەوت‌و هەشتدا کە لە بیست‌و چواری مانگی مایس دەستی پێکردو تا شەش مانگی ئەیلولی هەمان ساڵی خایاند، کە هەموو دەڤەری بادینان‌و سەرتاپای کوردستانی گرتەوە[1].

*** ئەنفالی سێ بۆ سەر ناوچەکانی گەرمیان:-**

لەبەر ئەوەی لە ڕووی سیاسی‌و ئابووری‌و جوگرافی‌و کۆمەڵایەتییەوە ڕژێم هەمیشە حیسابێکی تایبەتی بۆ گەرمیان دەکرد، هەردەم بەسەنگەری بەرگری‌و ئازایەتی پێشمەرگەو بەرخودانی جەماوەری دەزانی، هەر بۆیە دوابەدوای جێبەجێکردنی پرۆسەکانی ئەنفال لە دۆڵی (جافایەتی)و (قەرەداغ) بە پێی نەخشەیەکی داڕێژراوی سەربازی تۆکمە، لە ڕۆژی (٢٧ی ئاداری ساڵی ١٩٨٨) کەوتە کۆکردنەوەو مۆڵدانی هێزەکانی سوپاوجاش لە خورماتوو و کفری‌و کەلارو چەمچەماڵ‌و بانی مەقانی‌و قەرەحەسەن‌و لەیلان‌و دەربەندیخان‌و قەرەداغ... هتد

٣١ی ئاداری ساڵی١٩٨٨ پەلاماری بردەسەرشاخی (ئاش داخ) لە ڕۆژی ٧ی نیسانی ساڵی ١٩٨٨ هێرشەکانی لە هەموو میحوەرەکانەوە پەرەپێدا..

ئەم پەلامارە ڕاستەوخۆ لەلایەن تاوانبار (عەلی حەسەن ئەلمەجید)و (بارق عەبدوڵڵا حاجی حەنگە) سەرپەرشتی دەکران، لە چەمچەماڵ‌و سەنگاوو قادر کەرەم‌و لەیلان‌و خورماتووو دەربەندیخان‌و چەند قوڵێکی تری گەرمیانەوە پێشرەویان کرد، ئەگەرچی حەوت ڕۆژی تەواو هێزی پێشمەرگە، هێزی پشتگیری، بەرگری زۆر قارەمانانەیان نواند، چەندین ڕۆڵەی ئازاو دلێر شەهید بوون، بەڵام نابەرامبەری هێزەکان وەزعەکەی بەرەو کارەسات دەبرد، لە زۆربەی بەرەکانی شەڕدا دوژمن پاش زیانی زۆر پێشرەوی دەکرد، گوندەکانی کاول وێران دەکرد، خەڵکەکەشی ڕاپێچی ئەو کامپانە دەکرد، کە لە (سەر قەڵا)و (چەمچەماڵ)و (لەیلان)و (تۆپزاوا)و (ئالیاوە)و (قەرەتاموور).. ئامادەی کردبوون هێزی زۆری سوپا. بە پاڵپشتی دەیان فەوجی سووکی جاش‌و فەرماندەیی گۆڕبەگۆر (بارق عەبدوڵڵا حەنگە) بەسەرپەرشتی (علی کیمیاوی) ڕۆژ بە ڕۆژ گەمارۆی سەرخەڵکیان تەنگتر دەکردەوە، لە ئاسمانەوە بە فڕۆکەی (pilatus)و (هەلیکۆپتەر) لە زەویشەوە بۆ تۆپی دوور هاوێژ وڕۆکێت‌و کاتیوشا.. شاخ‌و گوند‌و دەشت‌و دەریان ئاگر باران دەکرد. ئەگەرچی (یوسف دزەیی) لە کتێبە بە نرخەکەی بە ناوی (ئەنفال. کارەسات‌و ئەنجام‌و ڕەهەندەکانی..)دا دەڵێت" سوپای عێراق کاتی هێرشکردنە سەرناوچەکانی گەرمیان بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بە پێویست نەزانی بەڵام شایەد حاڵەکانی ئەنفال‌و گەرمیانییەکان باس لەوەدەکەن لە دێی (تازەشار)یش ڕژێم چەکی کیمیاوی بەکارهێناوە، لە دوای حەوت ڕۆژ بەرگری‌و فیداکاری پێشمەرگەو هێزەکانی پشتگیری، لە ڕۆژی (١٤ی نیسانی ساڵی١٩٨٨) کە ئەو ڕۆژە بە ڕۆژی (ئەنفال) دیاریکراوە، لە کۆبوونەوەیەکدا لە دێی (مەسۆیی) بڕیار دەدرێت: هێزەکان بکرێن بە دووبەشەوە، بەشێك بە پارتیزانی بمێنێتەوە، بەشەکەی دیکەی لەگەڵ پیرو پەککەوتەو نەخۆش‌و ژن‌و منداڵ بکشێنەوە بۆ دەرەوەی بازنەی پەلامارەکە، تایبەت بۆ ناوچەکانی شوان‌و شێخ بزێنی‌و قەڵا سێوکەو دەشتی کۆیە..

*** ئەنفالی چوار بۆ سەر قەڵاسێوکەو شوان‌و شێخ بزێنی‌و دەشتی کۆیە:-**

ڕۆژی (٣ی مایسی ساڵی ١٩٨٨) پەلاماری ئەنفالی چوار بە کیمیابارانکردنی گوندەکانی (گۆپتەپە)و (عەسکەر) دەستی پێ کرد، بەرەبەیانی (٤ی مایسی ساڵی١٩٨٨) هێزێکی گەورەی سوپاوجاش لە میحوەرەکانی چەمچەماڵ‌و ئاغجەلەرو شوان‌و پردێ‌و تەقتەق‌و کۆیەو قوشتەپە.. پەلاماری ناوچە ئازادکراوەکانی دەشتی کۆیەو قەڵا سێوکەو شێخ بزێنی سەروو، شێخ بزێنی خواروو و شوان‌و چەند گوندێکی دۆڵی سورداشیان دا، لەم پەلامارەشدا هێزەکانی ڕژێم ڕووبەڕووی بەرگری هێزی پێشمەرگەو جەماوەر بوونەوە، دوژمن زیانی زۆری بوو، دەیان پێشمەرگە شەهید بوون، نزیکەی (١٠) هەزار کەس بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتن نزیکەی (٧) هەزار کەسیان لە بیابانەکانی خوارووو‌ناوەڕاستی عێراق کۆمەڵ کوژران[2].

*** سەرچاوە:-**

١- ڕەشەبای ژەهرو ئەنفال، عەبدوڵڵا کەریم - بەشی یەکەم.
٢- ئەنفالی خاڵخاڵان، ئەنفالی چوار، مەلا شاخی، لاپەرە ٨-١٠.

*** شاڵاوی ئەنفال بۆسەر ناوچەی ئاوە سپی:-**

**مەرتیپ محەمەد جەبار**

**شوێنی جوگرافی ناوچەی ئاوە سپی:-**

ئەم ناوچەیە بەهۆی ئەوەی کەوتۆتە نێوان ناوچە شاخاوییەکانی کوردستانو ناوچە لمادییە تەختاییەکانی عێراقەوە، هەروەها سنوورێکی کەمی لەگەڵ ئێراندا هەیە[١]، ئەم ناوچەیە گرنگی تایبەتمەندی خۆی هەیە، چونکە ڕێژەیەکی باشی کانزای جۆراوجۆری تێدایەوە، بەهۆی ئەوەی کەوتۆتە نزیك ناوچە نەوتییەکانی عێراقەوە، وەك ناوچەکانی کەرکوكو خورماتووو خانقینەوە ئەمەش وا دەکات بەناوچەیەکی نەوتی بژمێردرێت، حکومەتی عێراق ڕەزامەندی دەرنەبریی بوو بۆ دەرهێنانیو سوود لێ وەرگرتنی ئەوەش بۆ ئەوەبوو کە لە چاڵە نەوتییەکانی کەرکوك کەم نەبێتەوە، هەروەها پێگەیەکی ستراتیژی هەیە لەنێوان شارەکانی هەرێمی کوردستاندا، ناوچەنەوتییەکانی کوردستان بە گشتیو ناوچە نەوتییەکانی گەرمیان بە تایبەتی (کەرکوك) ئامانجی سەرەکی ڕژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق بوەو هەمیشە هەوڵی پەلکێش کردنیان داوە، بۆیە ڕژێمەکان درێغیان نەکردوە لە بەکارهێنانی سیاسەتی نارەوا وەکو سیاسەتی بە عەرەب کردنو ڕاگواستنو.. هتد سەرئەنجام بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان بەشاڵاوی بەدناوی ئەنفالی (١٩٨٨) بۆ سەرناوچە گوندنشینەکان دڕندەییان گەیشتە لووتکە[٢].

هەروەها لە ساڵانی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا وەك هەوڵێکی چڕوپڕی حکومەتی عێراق بۆ دەستگرتن بەسەر ناوچەکانی کەرکوكو گەرمیانداو هەوڵدان بۆ کردنی بەنشینگەی عەرەب دەستیانکرد بە سیاسەتی عەرەب نیشتەجێکردن لە ناوچە کوردییەکاندا، ناوچەی ئاوەسپیش لە پارێزگای کەرکوك دابڕێنراو خرایە سەر پارێزگای سلێمانی بەبیانوی ئەوەی کە حکومەت چەند فەرمانێکی سیاسیو کارگێڕی دەرکردوە وەك دروستکردنی ناحیەیەکی نوێ بەناوی (تیلەکۆ)و دروستکردنی قەزای کەلار لە هەردوو ناحیەی (پێبازو شێراونە)وە پاشان خستییە سەر پارێزگای سلێمانی، لە کاتێکدا ناوچەی ئاوە سپی پێشتر سەر بە ناحیەی سەرقەڵاو قەزای کفری بووە، کە سەر بە پارێزگای کەرکوك بوون، ڕژێمی بەعس ئەم کارەشی بۆمەبەستی کەمکردنەوەی ڕێژەی کورد بووە لە کەرکوكو دامو دەزگا حکومییەکاندا[٣].

حکومەتی عێراق لە بیری سیاسەتی خۆیدا بۆ دەستگرتن بە سەر کەرکوكو گەرمیاندا بڕیاری سیاسەتی (تەعریب کردن)ی ناوچەکەی داوە، بە قسەی عەلی حەسەن مەجید لە کۆنگرەیەکدا لە نیسانی ساڵی (١٩٨٩) باس لە سەر نەگرتنی پرۆسەی بە عەرەب کردنی کەرکوك دەکات، بەو پێیەی نەیتوانیوە ناوچەی کەرکوك بە تەواوی تەعریب بکات سەرەڕای خەرجکردنی زیاتر لە (٦٠) ملیۆن دینارو هێنانی ژمارەیەکی زۆری عەرەب لە ناوەڕاستو باشووری عێراقەوە هەر بۆیە بە ناچاری پەنایان بۆ شاڵاوی ئەنفال بردووە لە ناوچەکەدا[٤].

هەروەها هەوڵێکی دیکەی بەغداد بۆ کەمکردنەوەی مەترسی لە سەر ناوچەکانی گەرمیانو کەرکوك، ئەنفالکردنی ئەم ناوچەیە بووە کە کە ناوچەی ئاوە سپیش بەشێکە لەم شوێنە، ئەویش بۆ ئەوەی ڕێژەی نەژادی کورد کەم بکاتەوەو بەرەو خاڵی سفری بەرێت وە ژمارەو ڕێژەی عەرەبیش زیاد بکات، ئیتر بە ئاسانی ئەم ناوچەیە دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی حکومەتی عێراقەوە، بۆیە بەغداد وای تۆمارکردبوو لە پێشبینییەکانی خۆیدا کە لە ئایندەدا ئەم ناوچەیە دەبێتە مەترسی بۆ سەر بەغداد، چونکە هاو سنووری ئێران بوو، کە کاریگەری گرنگی لەسەر ستراتیژی باکووری عێراق بووە لە هەموو ڕووەکانەوە[٥].

**ناوچەی ئاوەسپی پێگەی دووەمی شۆڕش بوو:-**

ئەم ناوچەیە لە بەرئەوەی دەکەوێتە نێوان ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستانو حکومەتی بەغداوە، هەمیشە جێگەی مەترسیو کێشەو ململانێ بووە، دانیشتووانی ئەم ناوچەیە بە زۆری لە دوو عەشیرەت پێکهاتوون ئەوانیش عەشیرەتی (داودەو زەنگنە)ن، بەردەوام ولە مێژەوە یارمەتیو هاوکاری بەشێك لە شۆڕشەکانی کوردستانیان کردووە، هەر لە شۆڕشەکانی شێخ مەحمودو شۆڕشی ئەیلولو شۆڕشی نوێی گەلی کورد کە لە (١٩٧٥)زایینی دەستی پێکرد[٦]، بەردەوام خەڵکی ئەم ناوچەیە پشکی شێریان بەرکەوتووە لە خەباتی ڕزگاریخوازی گەلدا بە تایبەتی لە هاوکاریو پشتگیری کردنی شۆڕشی نوێی گەلی کورد کە ئەرکو قورساییەکی زۆری خستبووە سەر گوندنشینانی ئەم ناوچەیە، بەم شێوەیە ناوچەی ئاوە سپی ناوچەرگەی سیاسی شۆڕشی نوێ بوو، ڕۆڵەی گوندنشینەکانی گەرمیان (ناوچەی ئاوە سپیش بەشێکە لە ناوچەکانی گەرمیان) زۆربەی هێزی ڕێکخراوەکەیان پێك دەهێنا[٧]. هەروەها زۆربەی سەرکردەو پێشمەرگەکانی ئەم شۆڕشە خەڵکی ئەم ناوچەیە بوون سەرەڕای ئەنجامدانی چەندین کاری سیاسیو چەکداری دژی ڕژێمی بەعس لە سنووری ئەم ناوچەیەدا، هەر بۆیە ناوچەی ئاوە سپی بەردەوام بەپێگەی دووەمی شۆڕش دانراوە، لە هەمان کاتدا ناوچەیەکی مەترسی دار بووە بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی ڕژێمی بەعس لە کەرکوكو دەورووبەری[٨].

دوای ئەوەی لە ساڵی (١٩٨٤- ١٩٨٨) چەندین شوێنو لادێی کوردستانو ناوچەی دیکەی وەك ئاوە سپی ئازاد کرابوون، کە لە ژێر دەستی پێشمەرگەی (ی. ن. ك)دا بوون[٩]، بەرادەیەك سنوورەکەی لەنێوان سەنگاو تاکو کفری لە باکوورەوە تا باشووروە پێباز تاکو ناحیەی نەوجولو قادر کەرەم لە خۆر هەڵاتەوە بەرەو خۆرئاوای ناوچەکە، ئەویش بە هۆی ئەوەی کە لە کوردستانداو بە تایبەتی لە ناوچەی گەرمیاندا بۆشاییەکی سیاسیو سەربازیو کارگێڕی هاتبووە ئاراوە، چونکە زۆربەی سوپای عێراق لە بەرەکانی شەڕی عێراق – ئێراندا بوو، هەر بۆیە نەدەپەرژانە سەرناوچەکانی کوردستان بۆ ڕاوەدونانی هێزی پێشمەرگە،

سەرەڕای ئەوەی چەندین خێزانو کەسو کاری هەڵاتوو لە دەستی سەربازیکردنی زۆرەملێی عێراق، لە شارەکانی کەلارو کفریو خورماتوو کەرکووکەوە هەڵهاتبوونو پەنایان بردبووە بەر ناوچەکانی دەورووبەری ئاوە سپی[١٠]، ئەمەو چەندین مەفرەزەی سەربازی حیزبی شیوعیو پارتیو حیزبە ئیسلامییەکانی لێ بوون، هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە یارمەتی خەڵکی ئەم ناوچەیە پەلاماری بنکەو بارەگاو رەبییەکانی رژێمی بەعسیان دەدا، بە ئاشکراو بە نهێنی ئەمەش بووە هۆی شکاندنی ناوو نفوزی بەعسو نیشانە لاوازەکانی دەرکەوتبوو لەم ناوچەیەدا بەرامبەر بە هێزی پێشمەرگە[١١]، هەروەها خەڵکی ئەم دەڤەرە بە چاوی سووكو ریسواوە تەماشایی حیزبی بەعسیان دەکرد، لە واقعیشدا هەر وا بوو، بۆیە لەم روانگەیەشەوە حیزبی بەعس رقو کینەیەکی زۆری لەلا دروست بوو بەرامبەر خەڵکی دەڤەری گەرمیانو ناوچەی ئاوە سپی[١٢].

ئەمەش وایکرد شاڵاوی ئەنفال لەم ناوچەیەدا زیاتر درندانەتر ئەنجام بدرێت، هەروەها رژێمی بەعس ویستی ئەوە بە شۆڕشی کورد بسەلمێنێ کە دوای گرتنی بارەگای سەرکردایەتی شۆڕش لە ناوچەی دۆڵی جافایەتی ئیتر هیچ شوێنێکیان بۆ ناهێڵێتەوە لە ناوچەکانی کوردستانی عێراق دا، تا درێژە بە کارو چالاکییەکانیان بدەن دژی رژێم، چونکە تا ئەو کاتەش هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەناو خاکی کوردستانەوە چالاکیان دژی رژێمی بەعس ئەنجام دەدا، هەروەها مەبەستێکی دیکەی رژێم لە وێرانکاریو راگواستنی خەڵکی گوندەکان بۆ ئۆردوگا زۆرە ملێکان لە پرۆسەی ئەنفالدا ئەوە بوو کە هێزی پێشمەرگە لە گوندەکان دابرێتو گوندەکانیش لە شارەکان دابرێت، تا هیچ زانیارییەك لەسەر شۆڕش نەزانرێت وە خەڵکیش واتێبگەن کە شۆڕش کۆتایی پێ هاتووەو تووشی نسکۆ بووە[١٣]، هەروەها هۆکارێکی دیکەی ئەنفالکردنو گەورەی شاڵاوەکە لەم ناوچەیەدا ئەوە بوو کە لە ئەنفالی دووی ناوچەی قەرەداغدا خەڵکێکی زۆر رایان کردوو هەڵهاتن بەرەو ناوچەی گەرمیان[١٤]، پەنایان بردە بەر گوندەکانی ناوچەی ئاوە سپیو دەورووبەری، دواتر لەلایەن رژێمی بەعسەوە ئەوانو خەڵکە رەسەنەکەی ئەم ناوچەیەش ئەنفالو بێ سەروشوێن کران، لە قۆناغی سێی شاڵاوەکانی ئەنفالدا[١٥].

*** پلانو هێرشکردنە سەر ناوچەی ئاوەسپی:-**

بەپێی کتێبی (جینۆساید لە عێراق... پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد)ی رێکخراوی (مێدڵ ئیست ووچ) پلانو هێرشکردنە سەر ناوچەی گەرمیان بەسەر سێ پلانی تۆکمەدا دابەشکراوە ئەوانیش.

یەکەم: پلانی پەلاماری دووز خورماتوو.

دووەم: پلانی پەلاماری قادر کەرەمو باکووری گەرمیان.

سێیەم: پلانی پەلاماری سەنگاوو باشووری گەرمیان[١٦].

بەپێی ئەم نەخشەو پلانانە بێت سوپای رژێمی بەعس لە چەندین ناوچەو شوێنو جادەو میحوەرو قۆڵەوە هێرشیان بردووەتە سەر ناوچەی ئاوە سپی، قۆڵو میحوەرەکانیش ئەمانەبوون:-

١- لەدووز خورماتووەوە بەرەو گوندی باشتەپەو چەمی ئاوەسپی.

٢- لە کفرییەوە بەرەو گوندی ئۆمەربلو توکنو عەزیز قادر[١٧].

٣- لە کەلارەوە بەرەو ناحیەی تیلەکۆو گوندی کوڵەجۆو قولیجان ئەمین قارەمان.

٤- لەناحیەی سەنگاوەوە بەرەو گوندی سەرقەڵاو گوڵباخەکان[١٨].

ناوچەی ئاوەسپی کەوتە بەر پەلامارو هێرشی سوپایی رژێمی بەعس لەبەرەبەیانی رۆژی (٧) نیسانی ساڵی (١٩٨٨) دا، پێشەنگی هێزەکانی سوپاو فەوجەکانی جاشو جەیشو مەفرەزە خاسە کەوتنە جموجۆڵ لە قۆڵی دووزخوماتووەوە بەرەو باکوور هەڵکشان کە ناوچەکانی دەورووبەری رووباری ئاوەسپی دەگرێتەوە ئەو هێزەش خێرابوون بەسێ بەشی سەرەکییەوە:

یەکەمیان: رووەو رۆژهەڵاتو لە شارۆچکەی نەوجولەوە بەرەو گوندەکانی دەورووبەری چەمی ئاوەسپی چوون[١٩].

دووەم: هێزێکی دیکەی گەورەتر بەرۆخی رووباری ئاوەسپیدا هەڵکشاو بەرەو ناوچەکانی باکوور پێشڕوییان کرد هەرچەندە تووشی بەرگرییەکی کەمی پێشمەرگەی (ی. ن.ك) بوونەوە بەڵام پاش ماوەیەکی کەم توانیان هەرچی گوندەکانی پێش خۆیان هەبوو تەختی زەوی بکەن[٢٠].

سێیەم: بەڵام هێزی سێیەم بەرەو گوندی تازە شار چوونو وێرانیان کرد پاش بەرگرییەکی ئازایانەی هێزی پێشمەرگەی (ی.ن.ك) دواتر رژێم بەچەکی کیمیایی لێیانیداو شەهیدکران، هەروەها هەموو گوندەکانیشیان وێرانکرد[٢١].

لەکاتی شاڵاوەکاندا بۆ سەر ناوچەی ئاوەسپی یەکێك لەو فەوجانەی کە فەوجی (٢٥) بوو ئەرکەکەی تەواو نەکرد، بەڵام دواتر بە گوێرەی بروسکەی ژمارە (١٠٣٤٠)ی ئیستخباراتی دووزخورماتوو لە (١٠ی ١٩٨٨)دا دەرچووە کە فەوجەکە رایگەیاندبوو پاش شەڕێکی توند لەگەڵ چەکدارانی کورددا توانیان (١٧)گوندی ناوچەکە وێران بکەن کە گوندی وارانی خواروو وارانی سەرووی تێدابوو، خەڵکەکەشی راپێچی قەڵای قۆرەتوو کردووەو مەڕومالاتیش بە تاڵان بردووە[٢٢].

بەڵام ئەم هێزە سەربەرەتلی دووەم بوو پاشان هەر لە چوارچێوەی هێرشو پەلاماری گوندەکاندا لەبەرەبەیانی رۆژی (٩نیسانی ١٩٨٨) رەتلێکی دیکەی سوپای رژێم کەپێکهاتبوو لە هەزاران عەسکەرو جاشو جەیش کە لە شاری کفرییەوە هێرشیان بردەسەر عەزیز قادرو ئۆمەربلو توکنو چوار شاخو عەلیانی تازە... هتد[٢٣].

پاش بەرگرییەکی قارەمانانەی هێزی پێشمەرگەی (ی.ن.ك) ئەویش بەهۆی گەمارۆدانی گوندەکانی دەورووبەر وەك گوندی (چوار شاخ) ئیتر هێزی پێشمەرگە شکاو سوپای رژێم توانیان هەتا سەرچەمی ئاوە سپیو سەرجەم گوندەکان خاپوور بکەنو سامانیان بەتاڵان ببەنو دانیشتووانەکەشی راپێچی قەڵای قۆرەتوو بکەن لەو بەری رووباری سیروانەوە[٢٤].

هەروەها هێزێکی زەبەلاحی سوپای عێراق لە ناحیەی سەنگاوەوە بەرەو رۆژئاوا بەمەبەستی لێدانی بنکەو بارەگای

ی.ن.ك) لە دۆڵی گوڵباخ لەو شەڕ و پەلامارانەدا چەند پێشمەرگەیەکی (ی.ن.ك) شەهیدو بریندار بوون[٢٥]، خەڵکی ناوچەکەش بەهۆی تۆپبارانەکانی ڕژێمەوە لە گوندەکانیان دوورکەوتبوونەوە بەڵام بەداخەوە بەفرتو فێڵو درۆی جاشەکان ناچار هاتنە ژێر باڵی زاڵمەوە ئەوانیش وەك سەرجەم گیراوەکانی تریان ئەنفال کران[٢٦].

بۆ جارێکی دیکە سوپای ڕژێم لە قۆڵێکی دیکەوە پەلاماری ناوچەی ئاوەسپی دا بەمەبەستی وێرانکردنی ئەویش قۆڵی کەلار بوو سەرلەبەیانی (٩نیسانی ١٩٨٨) هێزێکی پرچەکی ڕژێم بە فەرماندەیی ڕائید (مونزر ئیبراهیم) پەلاماری ناحیەی تیلەکۆ و گوندی کوڵەجۆی حاجی حەمە جانیان داو وێرانیانکرد پاش ڕاونان و قرکردنی ئەو خەڵکە لە گوندی ملە سوورەدا توانیان دوا ئامانجیان بپێکن کە بۆیان دیاریکرابوو لە (١٥/ ٤ ئەویش گوندی قولیجانی عەمین قارەبان بوو کەدەکەوێتە نزیك چەمی ئاوەسپییەوە لێرەش جاش بووە ملۆزمی گوندەنیشینان و نەیانهێشت قوتاربن لە دەستی سوپای ڕژێم[٢٧] تا ئەو ڕادەیەی کە خێزانێك هەڵاتبوون و کەوتبوونە ناو هێزێکی جاشەوە کە فەتاح بەگ فەرماندەیی بوو فەتاح بەگ پێی وتبوون (ئیتر سەردەمی ئێوە تەواو بوو ... زەمان زەمانی حکومەتە).

لە ڕۆژی (١٣ی نیسانی ١٩٨٨) زایینی هێزەکانی ڕژێم تەنها لە گوندی تەپەسەوز تووشی بەرگرییەکی کەمی هێزی پێشمەرگەی (ی.ن.ك) بوون بەپێی برووسکەی (١٠٦٨٧)ی ئیستخباراتی قەزای کەلار[٢٨] هەروەها ڕەتڵە سەرەکییەکانی کفری کە بەرەو ژوور پێشڕەوییان کرد و توانیان زۆربەی گوندەکانی ئەو ناوچەیە وێران بکەن و دوا ئامانجیان بپێکن کە بۆیان دیاریکرابوو ئەویش گوندی فەقێ مستەفای سەرچەمی ئاوەسپی بووکە تەختیان کرد وخەڵکەکەشیان ئەنفال کرد[٢٩].

لەو سەروبەندەدا خەڵکی ناوچەی گەرمیان بەگشتی و ناوچەی ئاوەسپی بەتایبەتی شڵەژابوون و نەیاندەزانی چیبکەن و بۆکوێ بڕون بەڵام بەناچاری چوونە ژێر باڵی ستەمکارەوە و هەموو دانیشتووانی ناوچەکە بەهۆی ئەوەی دەوریان گیرابوو بە کۆمەڵ ڕوویان لە گوندی ملەسوورە و قەڵاقۆچالی دەکرد. چونکە سەرجەم خەڵکی گوندەکان چارەنووسی خۆیان نەدەزانی ئایا یاخێن لە ڕیزی نیشتمانیدان، دوای ئەوەی هێزەکەی کەلار لەناوچەی ئاوەسپی کشایەوە دەوری گوندی ملەسوورە و قەڵاقۆچالیان دا کە ئەو کاتە بەپێی خەمڵاندن زیاتر لە (٢٠) هەزار هاوولاتی گوندنیشینی دەوروبەری ئاوەسپی و ناوچەی داودە و ڕۆغزایی و جاف و...هتد، لە گوندی ملەسوورە کۆبووبوونەوە[٣٠] ڕۆژێك لە گوندی ملەسوورە مابوونەوە هەندێکیان بەهۆی جاشە خزمەکانیان یان بەپارەو بەرتیل خۆیان گەیاندە ئۆردوگای زۆرەملێی سمودی نزیك کەلار کە ماوەی ساڵێك بوو دروستکرابوو، بەڵام ئەوانی دیکە مانەوە و چاوەڕوانی چارەنووسێکی نادیار بوون کە کەس نەیدەزانی چی چارەنوسێکە بەڵام دواتر بەهۆی پروپاگەندەی مستەشار و جاشەکان وەك دەیانگوت دەتانبەن بۆ ئۆردوگاکان و پیاوەکانتان دەکەن بە جاش و زەویتان پێدەدەن عەقاریشتان بۆ سەرف دەکرێت[٣١]. تا ئەوەندە گروتینی توورەیی خەڵکەکە نامێنێت و هێمن دەبنەوە تا هاتنە قەناعەت تا بچنە ژێر چەتری حکومەتەوە کە باوکی میللەتە هەرچەندە ئەگەر قورسیش بێت، ئەوەبوو لە ناوەڕاستی مانگی نیساندا واتە دەکاتە (١٤ی نیسانی١٩٨٨)زایینی هێزەکانی ڕژێم لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری جاش و جەیشدا توانیان سەرجەم ئەو خەڵکەی کە لە گوندی ملەسوورە کۆبووبوونەوە و خڕبوون ڕەوانەی قەڵای قۆرەتوو بکەن[٣٢]. هەر خێزانێك گەرتراکتۆری خۆی هەبووایە ئەوا هێزەکانی ڕژێم تەنها چاودێریان دەکرد تا گەیشتنە قەڵای قۆرەتوو، وە ئەوانی تریش بەزۆر سوار ئۆتۆمبیلی سەربازی (زیل یان ئیفا) دەکران و دەنێردران بۆ قەڵای قۆرتوو کە بارەگای فیرقەی (٢١) پیادەی سوپای عێراقی لێبوو، بەو شێوەیە خەڵکە سڤیلەکەی گەرمیان و ناوچەی ئاوەسپی بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتن[٣٣].

هەندێکیان لە گرد و تەپۆڵکەکانی ناوچەی ئاوە سپیدا خۆیان و خێزانەکانیان حەشاردابوو بەڵام لەلایەن جاشە خۆفرۆشەکانەوە دۆزرانەوە و ئەوانیش ئەنفال کران، ئەوانەی کەبەر ئەم شاڵاوە نەکەوتن یا پێشمەرگە بوون یان خۆیان دەکردە شوان و مەروماڵاتیان لە ناوچەی قەدغە کراوەوە (موحەرەمە) دەگەیاندە نزیك شارەکان کە موحەرەنەبوو[٣٤]، دوای ئەو هەموو پەلامار و هێرشانەی ناوچەکانی گەرمیان و ئاوەسپی هێزەکانی ڕژێمی بەعس لە (٢٠ ی نیسان ساڵی ١٩٨٨) زایینی گەڕانەوە شوێنی پێشتری خۆیان کەلێوەی هاتبوون[٣٥]، ئەمەش دوای ئەوە دێت کە یەك گوندی گەرمیان لە ناوچەی قەدەغەکراودا نەما بە ئاوەدانی بەر شاڵاوی ئەنفال نەکەوێت و تەختی زەوی نەکرێت بەوەش کۆتایی بەپرۆسەی ئەنفالی سێیەم هات لە ناوچەی گەرمیاندا[٣٦].

*** (زیانەکانی شاڵاوی ئەنفال لە ناوچەی ئاوەسپی):**

ناوچەی ئاوەسپی بە حوکمی ئەوەی کەوتووەتە نێو سنووری قۆناغی سێیەمی شاڵاوی ئەنفالەوە لە گەرمیان، وە شاڵاوی ئەنفال لەم ناوچەیەدا کارەساتێکی قورس و خراپ و ماڵوێرانی لێکەوتەوە، بێگومان ناوچەی ئاوەسپی لە چەندین ڕووەوە پشکی شێری بەرکەوتووە لە زەرەو زیانەکانی شاڵاوی ئەنفال، کە بە کورتی لەم خاڵانەدا دەیانخەینە ڕوو:

**-لە ڕووی مرۆییەوە:**

ناوچەی ئاوەسپی نزیکەی (٣٤) گوند دەگرێتەوە[٣٧]، ئەمە لە ڕووی کارگێڕییەوە، بەڵام سنووری جوگرافیای سروشتی زۆر لەوە زیاترە، هەروەها ناوچەیەکی بەرفراوانی دەشت و هەردوو تەپۆڵکەی لە خۆگرتووە، ئەم ناوچەیە بەپێی خەمڵاندن و ئامارەکان کە بەردەست کەوتوون زیاتر لە (٥٠٠) خێزانی تێدابووە، هەروەها زیاتر لە (٤٠٠٠- ٥٠٠٠) کەسی تیا ژیاوە، لە ئامارێکدا کە لە (١٤) گوندی ناوچەی زەنگەنەی ئاوەسپی ئەنجامدراوە، قوربانییەکان بەم شێوەیە بوون، لە کۆی (٣٣٩) ماڵ لە پێش شاڵاوی ئەنفال (٧٩٥) کەسی ئەنفال کراوە[٣٨]. سەرەڕای ئەوەش (٢٥)ماڵ بە تەواوی لە ناوچوون و ئاسەواریان بڕاوەتەوە و لە گۆڕەبە کۆمەڵەکاندا زیندەبەچاڵ کراون، هەروەها ژمارەیەك لەو کیژۆڵانەی کە ڕەوانەی مەلهەو

یانە شەوانەکانی میسرکراون لە ئافرەتانی ئەم دەڤەرە بوون (ناوچەی ئاوەسپی)[٣٩]. بەلام بەپێی هەندێ بەلگە کە باسی تاوانەکانی رژێم دەکات لە کاتی ئەنفالدا (ئەنفالی سێ) ئەویش لەو یاداشتنامەیەدا باسکراوە کە بەرەی کوردستانی ئاراستەی (UN) یان کردووە لەگەل لیژنەی مافی مرۆڤدا، کە تێیدا باس لەوە کراوە کە زیاتر لە (٧٤٠٧) ئافرەتی ناوچەی گەرمیان بە تایبەت ناوچەی ئاوەسپیو جەباری بەندکراون لە بەندینخانەی قەزای دوبزدا، هەروەها زیاتر لە (٤٥٦٠) ژنو منداڵی گەرمیانو ناوچەی ئاوەسپیو داودە لە زیندانەکانی رژێمی بەعسدان[٤٠]، بەلام ئەوەی کە لە ئامارەکانی ئەم توێژینەوەیەدا کۆکراوەتەوە بە تەواوی و رێك (١٨٤٠) کەسی بێتاوانی دانیشتووی ناوچەی ئاوەسپی بێسەروشوێن کراون. بەم پێیەش بێت زیاتر لە نیوەی ئەو ئامارانەی کە لە یاداشتەکەی بەرەی کوردستانیدا ئاراستەی (UN) کرابوو، ژنو پیاوو منداڵو پیروپەککەوتەی ناوچەی ئاوەسپین کە بەرشاڵاوی ئەنفال کەوتوون، بەلام هەندێجار ئامارەکان زیاتر خەملاندنن ئەوەش کارێکی ئاساییە چونکە جینۆساید لەناو بردنێکی هەرەمەکی مرۆڤەکانە لە هەموو جیهاند.

– لە رووی ئابوورییەوە:–

ناوچەی ئاوەسپی هەرچەندە ناوچەیەکی بەرفراوانەو ژمارەی گوندەکانی ناحییەی ئاوەسپی کەمن، بەلام هەندێك گوند هەیە خۆیان بە مەوقعی ئاوەسپیو خەلکی ناوچەی ئاوەسپی دەزانن، بەم جۆرە ژمارەی گوندەکانی دەگاتە پتر لە (٥٠) گوند، کە زیاتر لە (١٠٠٠) خانوو کەپرو چەرداخو حەوشەو گەور رووخێنراون، هەروەها زیاتر لە (٢٠) مزگەوتو قوتابخانە رووخێنراون لەگەل (٤) ئاشی ئاودا لە گوندی (قەوالیو خانی سەروو) بوون کە زۆربەی ئاشەکان لەسەر ئاوی رووباری ئاوەسپی بوون، هەروەها زیاتر لە (٢٠٠٠٠) بیست هەزار مەرومەلات بە تالان براون، لەگەل دەیان تراکتۆر و هەزاران کانیاو عەماراو کوێرکرانەوە[٤١].

سەرجەم گوندەکانی ئەم دەڤەرە وێرانو تەختی زەوی کران لەلایەن هێزەکانی سوپای رژێمی بەعسەوە، تەواوی ئەو دانەوێلانەی کە لەو سالەدا چێنرابوونو وە ئەوانەشی کە عەمبار (خەزن) کرابوون سووتێنرانو بەتالانو خەساردا بران سەرەرای کوشتنی چەندین (سەگ). کە پاسەوانی مەرومالاتی جوتیاران و لادێنییشانانی ناوچەکەیان دەکرد، پاشان کوشتن و لەناوبردنی هەزاران ولاخی بەرزەو گوێدرێژ، جگە لە چەندین زەرەرو زیانی ماددی تر کە بەرناوچەکە کەوتووە[٤٢].

**– لە رووی کۆمەلایەتییەوە:–**

بەشێکی زۆری ئەوکەسانەی کە ئەنفالکران پیاو بوون لەم ناوچەیەدا، بەم پێیە ئافرەتە بێ پیاوەکان (بێوەژنەکان) زۆر بوون وەك لە ناوچەکانی تر ئەمە سەرەرای بوونی سەدان منداڵی بێ باوك و دەیان منداڵی بێ دایكو باوكو تاقانە کە لە شالاوی ئەنفال رزگار ببوو، ئەوەش وای کردبوو کە خێزانە ئەنفالکراوەکان یان ئەو کەسانەی کە لە شالاوی ئەنفال رزگاریان ببوو رووبەرووی دەیان کێشەی کۆمەلایەتی جۆراجۆر ببنەوە، ئەمەش بەهۆی گەران بوو بەدوای بژێوی منداڵەکانیان لەنێو شارو شارۆچکەو باخو زەوییە کشتوکاڵییەکاندا، سەرەرای بە چاوی سووك سەیرکردنیان لەلایەن خەلکییەوە، چونکە پێشتر لە کۆمەلگایی کوردیدا ئافرەت کەمتر لە پیاوان کارو کرێکاریو کاسبیان دەکرد[٤٣] ئەو ئافرەتانەی کە خاوەنی منداڵی وردبوون دەبوایە بە دوای کاردابگەرانایە بۆ ئەوەی بژێوی ژیانی خۆیانو منداڵەکانیان پەیدابکردایە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە زۆر جار (قسەوباس)ی. ناراستو نەشیاویان بۆ هەلدەبەسترا، چونکە کۆمەلگەی کوردی ئامادەی ئەو جۆرە گوزەرانە نەبوو تا ئەو کاتە شتی وایان نەهاتبووە پێش چاو یان بەسەریاندا نەهاتبوو، سەرەرای ئەوەش چەندین منداڵی بێ دایكو باوك، وەچەندین پیروپەککەوتە هەبوون بە تەنها لە زیندانەکانی رژێمدا گەرابوونەوە[٤٤].

لە شارەکاندا لای خزمو کەسو کاریان بەکولە مەرگی ژیانیان بەسەردەبرد، چونکە هەر جارەی لە مالی کەسێکیان یان خزمێکیاندا بوون، بێگومان ئەمەش ژیانێکی سەختو دژوار بوو لە رووی دەروونییەوە!!، هەروەها ببوونە بار بەسەر شانی کەسو خزمانیان، چونکە خەلکی لەو رۆژە سەختەدا خۆی پێبەخێوی نەدەکرا نەك کەسانی تر، کەس وکاری قوربانیانی شالاوی ئەنفال لەبەر ئەوەی لە ئۆردوگا زۆرە ملێکاندا نیشتەجێ کرابوون، هەمیشە تووشی دەیان نەخۆشی جۆراجۆر دەبوون بەهۆی نەبوونی خزمەتگوزاری سەرەتاییو پیسبوونی ئاوو هەواو ژینگەکەیەوە، زۆربەی ئەمانە لە شاروشارۆچکەکاندا سەرگەردان بوون بۆ پارویەك نان بۆ خۆیانو خێزانە هەتیووبارەکانیان، سەرەرای ئەوەش رژێم زۆربەی ئەو کەسانەی (لە رەگەزی نێر بوون) کە لە شالاوی ئەنفال رزگاریان بوو بەزۆر دەیکردنە (جاش) یان سەرباز لە ریزی سوپا خوێن مژەکەیدا[٤٥].

*** سەرچاوەکان:–**

١– هەڤال ئەبو بەکر: ئەنفال جینۆسایدکردنی نەتەوەیەك لە بێدەنگیدا، گۆڤاری عەرعەر، ژمارە(٣) سالی سێیەم، لا٨٤.

٢– ئاری جەلال سالح: ئەنفال هەولێ بۆ جینۆسایدکردنی کورد، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (٣)، سەرچاوەی پێشوو، لا٩٤.

لەدوای راپەرینی ١٩٩١ بە بریاری حکومەت لە ناوچەکەدا ناوەندی ناحییەك دامەزرا، کە بەرێوەبەرایەتییەکەی لە گوندی خانی سەروو دایە، دواتر ناونرا ناحییەی ئاوەسپی (توێژەر).

٣– سالح هەلاج: چەردەیەکی مێژووی دەڤەری گەرمیان، ٢٠١١ لا ٤٢– ١٦٧.

٤– هەڤال ئەبو بەکر، سەرچاوەی پێشوو، لا ٨٥.

٥– هەمان سەرچاوە، لا ٨٣.

٦– چاو پێکەوتن لەگەل فایەق ئیبراهیم حەسەن، ناحییەی رزگاری، لە ١٩ی ئازاری ٢٠١٢. دەکەوێتە خوارووی زنجیرە چیایی قەرەداغەوەو ئارادەیەکیش دەکەوێتە خۆرهەلاتی

ناوچەی گەرمیانەوە، (توێژەر).
٧- هەڤاڵ ئەبو بەکر: سەرچاوەی پێشوو، لا ٩٤.
٨- هەڤاڵ ئەبو بەکر: سەرچاوی پێشوو، لا ٩٤.
٩- هەمان سەرچاوە، لا ٩٤-٩٥.
١٠-عومەر محەمەد: ئەنفالی گەرمیان سیاسەتێكو دوو ئامانج، سلێمانی، ٢٠١٠، لا ١٠٣.
١١- چاوپێکەوتن لەگەڵ فایەق ئیبراهیم حەسەن، سەرچاوەی پێشوو.
١٢- هەڤاڵ ئەبو بەکر: سەرچاوەی پێشوو، لا ٨٤.
١٣- هەڤاڵ ئەبو بەکر: سەرچاوەی پێشوو، لا٨٥.
١٤- نەسرین مەلا حکیم: ئەنفالو گرێ دەروونییەکان، سلێمانی، ٢٠١٠، لا ٧٣.
١٥- عومەر محەمەد: ئەنفالی گەرمیان سیاسەتێكو دوو ئامانج، سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٠.
١٦- میدل ئیست ووچ: جینۆساید لە عێراق پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، وەرگێرانی: محەمەد حەمە ساڵح تۆفیق، سلێمانی چاپخانەی تیشك، ٢٠٠٤، لا ١٩٣ - ٢٠٥.
١٧- زەمان عەبدە: مەرگەساتی ئەنفال، بەرگی یەکەم، هەولێر چاپخانەی منارە، ٢٠١٠، لا ٦٠.
١٨- هەمان سەرچاوە، لا ٦٠- ٦١.
١٩- ئاری جەلال ساڵح: ئەنفال. هەوڵێك بۆ جینۆسایدکردنی کورد، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (٤) ساڵی پێنجەم، بەهاری ٢٠٠٤، لا ٢٤.
٢٠- هەمان سەرچاوە، لا ٢٤.
٢١- هەمان سەرچاوە، لا ٢٥.
٢٢- یوسف دزەیی: ئەنفال کارەسات ئەنجام و رەهەندەکانی، چاپی دووەم، سلێمانی چاپخانەی شڤان، ٢٠٠٣، لا ٤- ١٠.
٢٣- هاوار عەباس: بەشێك لە حیکایەتەکانی ئەنفال سێ، بەرگی یەکەم، سلێمانی، چاپخانەی رەهەند، لا ٩ -١٠.
٢٤- هەمان سەرچاوە.
٢٥- ئاری جەلال ساڵح: گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (٤)، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٤.
٢٦- گۆران شێخ مستەفا: کاریگەرییە ئابوورییەکانی جینۆساید لە گەرمیان، سلێمانی، ٢٠١٠، لا ٥٦.
٢٧- میدڵ ئیست ووچ: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٠٩- ٢١٢.
٢٨- میدڵ ئیست ووچ: سەرچاوەی پێشوو لا ٢٦. سوپای رژێم بەدەستی ئەنقەست گوندی ملەسوورەی نە رووخاند بۆ ئەوەی هەموو خەڵکەکەی تێدا کۆببێتەوە، چونکە سەرجەم گوندەکانی تر رووخێنرابوون و خەڵکەکەش روویان لێدەکردەوە (کۆزە)، بۆ باشتر دەست بەسەرداگرتنیان، (میدڵ ئیست، ووچ، سەرچاوەی پێشوو لا٢١١).
٢٩- ئاری جەلال ساڵح: گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (٤)، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٩٠.
٣٠- یوسف دزەیی: سەرچاوەی پێشوو لا ١١٣. پارێزگاری سلێمانی لەرێگەی قایمقامی چەمچەماڵەوەو ئەویش لە رێگەی مستەشارەکانەوە پروپاگەندەی زۆریان کردبوو وەك گوایە (هەر خێزانێك ٢٠٠م) زەوییان پێدەدرێتو لەگەڵ سەرفکردنی سلفەی عەقاریشدا (دزەیی یوسف: سەرچاوەی پێشوو، لا ١١٣).
٣١- هاوار عەباس، سەرچاوەی پێشوو لا ٢٦.
٣٢- چاوپێکەوتن لە گەڵ فایق ئیبراهیم حەسەن: سەرچاوەی پێشوو.
٣٣- چاوپێکەوتن لەگەڵ سەلام عەلی کەریم، شایەتی رووداو ناحیەی رزگاری، ١٩ ئازاری ٢٠١٢.
٣٤- هاوار عەباس: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٦.
٣٥- عومەر محەمەد: ئەنفالی گەرمیان سیاسەتێكو دوو ئامانج، سەرچاوەی پێشوو لا ٦١.
٣٦- دڵشاد ئەحمەد: ژیانەوەی کوردستان، (GK. TV)، ٢٧/ ١/ ٢٠١٢.
٣٧- یوسف دزەیی: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٧.
٣٨- گەرمیان حەمدی پور: هەواڵەکان، (TV. KNN)، ٢٠١٢/٤/١٦.
٣٩- د. مارف عومەر گوڵ: جینۆسایدکردنی گەلی کورد لا٦١- ٦٢.
٤٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ فایق ئیبراهیم حەسەن: سەرچاوەی پێشوو. لەلای گوندنشینان نرخو قیمەت خۆی هەیە، چونکە مێگەلەکانیان لە دزو گورگەل دەپارێزێت سەرەرایی بەوەفایی، (توێژەر).
٤١- چاوپێکەوتن لەگەڵ سەلام عەلی کەریم: سەرچاوەی پێشوو.
٤٢- چاوپێکەوتن لەگەڵ فایەق ئیبراهیم حەسەن: سەرچاوەی پێشوو. ئافرەتێك لە ناوچەی گەرمیان لەلایەن کەسو کارەکەیەوە بە ناحەق کوژرا لە ساڵی (١٩٩٦)دا، بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەك هەبێت بۆ سەلماندنی تۆمەتە بۆ هەڵواسراوەکانی، کە بە تاوانی ئەخلاقیو ناشەرعی بۆی ئەژماردەکرا لە چاوی دەوروبەرەکەیەوە، کە کارێکی زۆر نارەواو قێزەونەو ئەوەش گەرانەوەیە بۆ سەردەمی جەهالەتو کۆیلایەتی، (توێژەر).
٤٣- کاوە رەشید حەمە ساڵەح: گۆڤاری ئەنفالستان، ژمارە (١٨) ساڵی ٢٠١١، لا٨٣- ٨٦.
٤٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ سەلام عەلی کەریم: سەرچاوەی پێشوو.

*** هێرشی سەربازیی بۆ ناوچەی جەباری:-**

ئارام رەزا عەزەدین
بەهرۆز سالح حەسەن

ناوچەی جەباری دەكەوێتە باكووری خۆرئاوای ئەنفالی (سێ)وە، دانیشتووانی گوندەكانی ئەم ناوچەیە لەگەڵ گەیشتنی هێزەكانی رژێمی بەعس گوندەكانی خۆیان چۆڵ كرد، كاتێك كە زانییان هێزەكانی سوپا لە قۆڵی كەركوك و چەمچەماڵەوە پێشرەویان كرد بەرەو ناوچەكە.
هێزەكانی رژێم لە (٩ی نیسانی ساڵی١٩٨٨) بە هێزێكی تۆكمەوە لە سوپای عێراق و جاش، لە چەند قۆڵێكەوە پەلاماری ناوچەكەیان داو لەم قۆڵانەوە بوو.
هێزێكی سەربازیی رژێم لەسەر رێگای كەركوك - چەمچەماڵ لەبانی مەقانەوە پێشرەییان كردو هێرشیان كردە سەر ناوچەكە[١].
هێزێكی تر لە شاری كەركوكەوە بەرەو ناحیەی لەیلان بەرێكەوتن و پەلاماری گوندەكانی باشووری رۆژئاواو رۆژئاوای ناوچەكەیان دا[٢]، كە لە گوندی هەنارەوە دەستی پێكرد تا وەكو مەحمود پەریزە درێژەی هەبوو[٣].
هێزێكی تری رژێم لە دووزخورماتووەوە بەرەو قادر كەرەم و دواتر بەرەو ناوچەكانی باشووری ناوچەی جەباری هێرشیان كرد[٤].

*** شەری كوڵەبان:-**

كوڵەبان یەكێكە لە گوندەكانی ناوچەی جەباری، دەكەوێتە باكووری ناوچەی جەبارییەوە، شەر لەم گوندەدا روویدا بۆیە ناونرا شەری كوڵەبان، پاش ئەوەی رژێم هێرشی كردە سەر ناوچەكە، وەك پێشتر باسمان كرد پێشمەرگەكانی كەرتی جەباری كە سەر بە (ی.ن. ك) بوون و كۆمەڵێك لە پێشمەرگەكانی حیزبی شیوعی لە گوندی كوڵەبان كۆبوونەوە بۆ بەرگریكردن لە ناوچەكە لە دژی سوپای رژێم بۆ سەر ناوچەكەوشەر لەنێوانیاندا روویدا لە ی نیسانی ساڵی١٩٨٨وە، پێشمەرگەكان توانییان بۆ ماوەیەك بەرگریی بكەن، بەڵام هێزەكانی رژێم بە پاڵپشتی هێلیكۆپتەری جەنگی و چەكی پێشكەوتوو، توانییان هێزەكانی پێشمەرگە تێكبشكێنن و سەرجەم گوندەكانی ناوچەی جەباری لە دوای ئەم شەرەوە وێران كران، وە پێشمەرگەكانیش بەرەو رۆژئاوا پاشەكشێیان كرد[٥]. خەڵكی ناوچەكە پاش هەڵهاتنیان لە گوندەكانی خۆیان، روویان كردە هەردو دەشت و دۆڵەكان، پاش ماوەیەك هەندێكیان خۆیاندا بە بەدەستەوەو هەندێكی تریان بەرەو شاری كەركوك و چەمچەماڵ هەڵهاتن لە رێگەی هەندێك لە سەرۆك جاشەكانی ناوچەكەوە[٦].

*** كۆكردنەوەی خەڵك و لە ناوبردنیان:-**

چەند ناوچەیەكی سەرەكیی هەبوون لە گەرمیاندا مەڵبەندی كۆكردنەوەی خەڵكی مەدەنی بوون، ئەم ناوچانەش ملە سوورەو فەقێ مستەفاو مەیدان و قۆرەتوو لە باشووری گەرمیان، ئالیاوەو لەیلان لە باكوور، یەكەم سەنتەری كۆكردنەوە بوون كە خەڵكە مەدەنییە هەڵهاتووەكەیان بۆ راپێچ دەكراو دواتر بەرەو بەندیخانە دەیانبردن.
سەبارەت بە كۆكردنەوەو گواستنەوەی دانیشتووانی ناوچەی جەباری بەپێی شوێنی جوگرافی ناوچەكە بۆ دوو شوێنی كۆكردنەوە راپێچ كران.

*** قادر كەرەم و ئالیاوە:-**

ئەو خەڵكانەی باشوورو خۆرهەڵاتی ناوچەی جەباری كە هەڵهاتبوون لە گوندەكانی خۆیان روویان كردە ئالیاوەو قادر كەرەم، ئەمەش كاتێك بوو كە جاشەكان هانی خەڵكەكانیان دەدا كە خۆیان بدەن بە دەستەوە، ئەمەش وای كرد كە بەشێكی زۆری خەڵكی ئەو ناوچانە بە تایبەت پیاوەكانیان خۆیان بە دەستەوە بدەن، لەگەڵ گیراوەكانی گوندەكانی تری ناوچەكە بەرەو ناوچەكانی باشووری عێراق راپێچ كران[٧].

*** لەیلان:-**

ئەو خەڵكانەی رۆژئاواو باكووری رۆژئاوای ناوچەكە كە هەڵهاتبوون، بەشێكی زۆریان دەستگیر كران و بەرەو لەیلان بەرێكران و كۆكرانەوە، بەڵام ژمارەیەكی زۆر لە خەڵك ئازاد كران لە لەیلان بەهۆی ئەوەی كە هەندێك لە سەرۆك جاشەكان توانییان كۆمەڵێك خەڵك ئازاد بكەن، جگە لەوەش هەوڵی هەڵهاتن لەم كەمپە زیاتر بوو وەك لە قادر كەرەم و ئالیاوە[٨].
ئەنفال هێرشێكی هەمەلایەنە بوو بۆ سەر كۆی ژیانی كۆمەڵگایەك، بۆ كوشتن و بێسەروشوێنكردن و وێرانكردنی گوندەكان و سووتاندنیان، تاڵانكردن و لە ناوبردنی ئاژەڵ و پەلەوەرو وێرانكردنی هەموو بنەماكانی ژیانی بوو[٩].
هێرشی سەربازیش بۆ سەر ناوچەی جەباری زەرەرو زیانێكی گیانیی و ماڵیی زۆری لێكەوتەوە، جگە لەو زەرەرو زیانانە زیانێكی زۆر بە ناوچەكە گەیشتووە، بەتایبەتی سروشتی ناوچەكەو لە ناوبردنی بەروبوومی گەنم و جۆو... هتد. كە بە هۆی ئەمەشەوە لەناوچوون.

## زیانە گیانی و ماڵییەکانی ناوچەی جەباری لە ئەنجامی هێرشی ئەنفالی سێدا

| ناوی گوند | ژمارەی ئەنفال | ژمارەی خانوو | ژمارەی مزگەوت | قوتابخانە | ژمارەی مەڕو و بزن | ژمارەی مانگا | ژمارەی ئۆتۆمبیل | ژمارەی تراکتۆر | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کوڵەبان | ٢٥ | ٤٩ | ١ | – | ٢٧١٨ | ٢٨ | – | ٢ | ١ چێشتخانە |
| مۆردانە | ١٠ | ٢٦ | ١ | – | ٢٠٨٥ | ١٧ | – | ١ | – |
| هەنارەی محەمەد شەریف | – | – | – | – | – | – | – | – | – |
| هەنارەی محەمەد سەعید | ١٣ | ٢٨ | ١ | – | ٢١٢٩ | ١٤ | – | ٢ | – |
| هەنارەی محەمەد ئەمین | ٥ | ٦ | – | – | ٨٥٩ | ١١ | – | ١ | – |
| زنەخۆر | ١ | ٧ | – | – | ٥٤٣ | ٩ | – | – | – |
| جانی | ٢ | ٣١ | ١ | – | ٢٣٧٨ | ٣٩ | – | ١ | – |
| تەکییە | ١٣ | ٦٩ | ١ | ١ | ٣١٢٦ | ١٠٦ | ٢ | ٤ | ٧ دوکان و ١چێشتخانە |
| زەوج | ٢ | ٤ | ١ | – | ٣١٧ | ١٨ | ١ | – | – |
| سۆران | ٢٦ | ٣٤ | ١ | – | ١٨٩١ | ٢٣ | – | ١ | – |
| قۆچەلی | ١١ | ٢٨ | ١ | ١ | ٢٣١٤ | ٣٠ | – | ٢ | – |
| شێخ محەمەدی سەروو | ٢٨ | ٢٥ | ١ | – | ٢٧٦٠ | ٤٢ | – | ٢ | – |
| شێخ محەمەدی خواروو | ٧ | ١٢ | ١ | – | ٩١٥ | ١٨ | – | ١ | – |
| بانگۆڵ | ٣١ | ٤٧ | ١ | ١ | ٢٩٢٧ | ٦٨ | – | ٢ | – |
| کانی بایز | ٢ | ٧ | – | – | ٢٤١ | ١٠ | – | ١ | – |
| قەڵا وەیس | – | – | – | – | – | – | – | – | – |
| پووزڵ | ١٩ | ١٧ | ١ | ١ | ٦١٨ | ٢١ | ١ | ٢ | – |
| چیمەن | ١٠ | ١٨ | ١ | ١ | ٧٣٧ | ١٨ | ١ | ١ | – |
| تاوێر بەرز | ١١ | ١٣ | ١ | ١ | ٧١٧ | ١٦ | ١ | ٢ | – |
| زەردە | ١٧ | ٢٦ | ١ | ١ | ٢٠١٥ | ٤١ | – | ٢ | – |
| مەحموود پەرێز | ١٥ | ٢٤ | ١ | ١ | ٢٤١١ | ٢٧ | ١ | ١ | – |
| کۆی گشتی | ٢٤٨ | ٤٧١ | ١٦ | ٨ | ٣١٨٠١ | ٥٥٦ | ٧ | ٢٨ | – |

* سەرچاوەکان:-

١- میدڵ ئیست وۆچ، جینۆساید لە عێراقدا پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، ، لا ١٩٩.

٢- چاوپێکەوتنی توێژەران لەگەڵ د. مەحمود کەساس، سلێمانی، ١٠/ ١٢/ ٢٠٠٧.

٣- عەلی نەبی ساڵح دۆسکی، عملیات الانفال في كردستان العراق، مطبعة حجي هاشم، الطبعة الأولى، اربيل، ٢٠٠٦، ص ١٦١.

٤- چاوپێکەوتنی توێژەران لەگەڵ جیهاد نەجمەدین ئەحمەد، کەرکوك، ١٣/ ٣/ ٢٠٠٨.

٥- چاوپێکەوتنی توێژەران لەگەڵ قادر بابا عەلی، گوندی کوڵەبان، ٣/١٧/ ٢٠٠٨.

٦- چاوپێکەوتنی توێژەران لەگەڵ نەسرەدین نووری ئەحمەد، چەمچەماڵ - شۆڕش، ٣/ ٤/ ٢٠٠٨.

٧- چاوپێکەوتنی توێژەران لەگەڵ، سەحەر نووری ئەحمەد، چەمچەماڵ - شۆڕش، ١١/ ٣/ ٢٠٠٨.

٨- مەریوان وریا قانع، ئەنفال و مۆدێرنە، ڕووداوێك لە دوامانەوە یان ئەگەرێك لە پشتمانەوە، گۆڤاری ڕەهەند، ژمارە (٧)، ١٩٩٩، لا ٣٢.

## * هێرش‌و پەلامارە سەربازییەکان لە ئەنفالی سێ بۆ سەر بناری گل:-

بەختیار محەمەد ئەمین
موزەفەر سالح قادر

ئەنفالی سێ هەروەك لە پێشدا ئاماژەمان پێکرد لە ٧ی نیسان تا ٢٠ی هەمان مانگی خایاند لە ساڵی (١٩٨٨)، سنوورێکی بەربڵاوی گرتەوە کە بە گەرمیان ناسراوە، هەردەو دەشتێکی پان‌و بەرینی هەیە لەبەشی هەرە باشووری کوردستانی عێراقدایە، وەها و سنووری ناوچەکانی عەرەب نشینی عێراقە، سنووری جوگرافی ئەم ناوچەیە لە باکوورەوە ڕێگای سەرەکی نێوان کەرکوك چەمچەماڵە، ڕۆژئاواوە شاری نێوان کەرکوك‌و شارۆچکەی دوزخورماتووە، باشووریشی بەرێگای هەرسێ شارۆچکەی کەلار، کفری، باوەنوورە، لە ڕۆژهەڵاتیشەوە چیاکانی قەرەداغە، ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە ئەم ناوچەیە چەقی جوگرافییەکەی ناحیەی قادرکەرەمە[1]. بەگشتی هێرش‌و پەلامارە سەربازییەکان لە ئەنفالی گەرمیان دەکرێ بە سێ قۆڵی سەرەکییەوە:

- قۆڵی دوزخورماتوو:

لە ڕۆژی ٧ی نیسان سەربازەکانی ڕژێم‌و ژمارەیەکی کەم لە جاش لە دوزخورماتوو دەرچوون، دوای دوو ڕۆژ لە کەرکوك‌و لەیلان‌و چەمچەماڵ‌و سەنگاوەوە هێرشیان کردە سەر ناحیەی قادر کەرەم‌و هێزەکانی دوزخورماتوو بۆ بە سێ بەشەوە:

١- هێزێك لە شارۆچکەی نەوجولەوە دەرچوو بەرە گوێچەمی ئاوە سپی.

٢- هێزی دووەمیش هێزێکی گەورەتر بوو لە لیوای ٦٥ی تایبەت پێکهاتبوو، بەئەمبەرو ئەو بەری گوێچەمی ئاوە سپیدا هێرشیان کردە سەر ئەو گوندانە پاش شەڕێکی تووند ١٧ گوندیان وێران کردو ماڵ‌و ئاژەڵەکانیان بەتاڵان بردو خەڵکەکەیان ڕاپێچی خۆبەدەستەوەدان کرد.

٣-هێزیکی هاوبەش بوو بۆ پەلاماردانی گوندی تازەشار[2]. ئەم هێرشە لە دوایدا بەووردی باسی لێوەدەکەین.

- **قۆڵی قادر کەرەم‌و باکووری گەرمیان:**

١- لە ١٠ی مانگی نیسان بەسەرپەرشتی " بارق عەبدوڵڵا حاجی حنتە" هێزێکی تایبەت بوو ئەم هێزەش لەنێوان ڕێگای سەرەکی کەرکوك - چەمچەماڵ بە ئاراستەی باشوور بڵاوبوونەوە، چەندین گوندی ئەم ناوچەیان ڕووخاندو خەڵکەکەیان ڕاپێچی تۆپزاوا کرد.

٢- لە ١١ی مانگ هێزێکی تر لە قادر کەرەمەوە دەرچوو بۆ ڕووخاندنی گوندی براهیم غوەڵام‌و گوندەکەیان ڕووخاندوو خەڵکەکەیان ڕاپێچی خۆ بەدەستەوەدان کرد.

٣- هێزیکی گەورەی سوپا لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری تانکدا هێرشیان کردە سەر ناوچەکانی عەشیرەتی زەنگەنە، بۆ تێکشکاندنی بارەگای پێشمەرگە لە دۆڵی گۆلباخ، پاش ڕۆژێك بەرگری گوندەکانی ناوچەکەیان ڕووخاندو ماڵ‌و ماڵاتەکانیان بە تاڵان بردوو خەڵکەکەیان ڕاپێچی خۆبەدەستەوەدان کرد[3].

- قۆڵی سەنگاو باشووری گەرمیان:

ئەم هێرشە پلانێکی تۆکمەتری بۆ دانرابوو بۆ ئەوەی لە ماوەیەکی کەمدا هەموو دێکانی ئەو سنوورە بروخێنن. شاڵاوەکانی ئەنفالی ئەم دەڤەرە دابەش دەکرێت بۆ ئەم هێرشانەی لای خوارەوە:

١- هێرشی یەکەم لە سەنگاوەو دەست پێدەکات بە ئاراستەی ڕۆژئاوا بەرەو شارۆچکەی دەربەندیخان.

٢- لەبەرە بەیانی ٩ی نیسانی ساڵی (١٩٨٨)دا هێزێکی گەورەی سوپا لە شارۆچکەی کفری بە ئاراستەی باکوور هێرشیان کرد، هێزێکی بچووك لە سوپا سەرەکییەکە جیاوە بوو بەرەو باکووری ڕۆژئاوا، پاش بەرگرییەکی کەم گوندی ئۆمەربل وبیست گوندی ناوچەکەیان وێرانکرد.

٣- لە ٩ی نیسان هێزێکی گەورە لە شارۆچکەی کەلارەوە بەرێکەوت بەرەو باکوور بۆ شارۆچکەی تیلەکۆ، بەهۆی تۆپبارانی زۆرەوە خەڵکێکی زۆر ڕوویان کردە هەردەکان[4].

٤- بەشێکی تری سوپا لە ناحیەی باوەنورەوە بە ئاراستەی باکوور پێشرەویان کرد دوای بەرگرییەکی کەم ١٤ گوندیان ڕووخاند، بەڵام هێزە هاوبەشەکەی تر لە باشووری شارۆچکەی دەربەندیخان ڕووبەڕووی بەرگرییەکی کەم وێنە بوونەوە لە گوندی شێخ تەویل، پاش پێنج ڕۆژبەرگری توانیان گوندی شێخ تەویل داگیر بکەن[5]. ئەنفالی سێ بە ئەنفالی گەرمیان ناسراوە زۆرترین ژمارەی خەڵك بێ سەرو شوێن کراوە بە تایبەتی لە ڕۆژی ١٤ی نیسانی ١٩٨٨دا بیست هەزار کەس لە ژن‌و پیاو پیرو منداڵ لە هەردوو گوندی کولە جۆو ملە سوورە دا کۆکرانەوە بە ئیڤای سەربازی بەرەو سەربازگەی قۆرەتوو براون، هەر لەبەر ئەوەش ئەو ڕۆژە بە ڕۆژی یادکردنەوەی ئەنفال دانراوە[6].

***هێرشی سەربازی بۆ سەر بناری گل:**

هەروەك لە پشدا ئاماژەمان پێکرد سنووری بناری گل دەکەوێتە بەشی باشووری ڕۆژئاوای ئەنفالی سێ‌وە بە درێژایی جەوڵ ناساز لەسەر ڕێگای سەرەکی کەرکوك - قادر کەرەم کە نزیکەی ١٥ کم لە شارۆچکەی دوزخورماتووەوە دوورە. بە ماوەی پێنج ڕۆژێك دانیشتووانی بناری گل هەستیان کردبوو کە سەربازێکی زۆر لە شارۆچکەی دوزخورماتوو کۆبوەتەوەو درکیان بەوە کردبوو کە ئەم هێزە بۆ پەلاماری ناوچەکە خۆی ئامادەکردووە، بۆیە بۆ ماوەی سێ بۆ چوار ڕۆژ پێش هێرشی سەربازی، دانیشتووانی بناری گل ڕوویان کردە هەردەو هەڵەتەکان بە تایبەتی بەشی باکوورو ڕۆژئاوای بناری گل[7]. دوای چۆڵ بوونی گوندەکان هێزی پێشمەرگە خۆیان ئامادە کردبوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو هێرشە سوپاییە چاوەڕوانکراوە دەستەیەکی ٢٤ کەس لە هێزی پێشمەرگە لە گوندی تازەشاردا جێگیربوون، سەر ئەنجام بەرە بەیانی ٩ی نیسان سوپا سەرەکییەکەی دوزخورماتوو هێزێکی لێ جیاوەبوو لە ڕێگا سەرەکییەکە بەرەو ڕێگا خۆڵەکەی بناری گل، دوای تێپەڕبوون بە هەردوو گوندی کۆرمۆرو فەرهاد بەگ سوپا لەنێوان تازە شارو فەرهاد بەگدا بۆ ماوەیەکی کەم

وەستا، درکیان بەوە کردبوو کە هێزی پێشمەرگە لە گوندی تازە شاردا سەنگەریان هەیە[8].

*** شەڕی تازەشار:**

لێرەدا بە پێویستی دەزانین بەوردی باسی شەڕی تازە شار بکەین لە بەر ئەوەی بە کۆتایی هاتنی شەڕ سەراتاپای بناری گل رووخێنرا لەلایەن سوپای داگیر کەرەوە، تازەشار یەکێکە لە گوندەکانی بناری گل کە نزیکەی ٥٤٠م بەرزە لە ئاستی رووی دەریاوە، دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی بناری گل، شەر لەم گوندەدا روویدا بۆیە بە ناوی تازەشارەوە ناونراوە. سوپا درکی بەوە کردبوو کە هێز لە تازەشارد بۆیە لە شوێنی دوورەوە دێیەکەی تۆپباران دەکرد بە راجیمەی تەمساوی بۆ ماوەی نزیکەی دووکاتژمێر[9]. بەشێوەیەك زۆربەی شایەتحاڵەکان واهەستیان کردبوو کەس لەناو دێیەکەدا نەماوەو خانووەکان زۆربەیان رووخاند لە ئەنجامی تۆپبارانەوە، ئینجا هێزی پیادەی سوپا هێرشی کردە سەر گوندەکەو لەلایەن ئەو ٢٤ پێشمەرگەی کە لە ناو گوندەکەدا سەنگەریان دانابوو هێزی پیادەی سوپای داگیرکەریان شکاند، لەم شکانەدا چەند کوژراوێك هەبوو، دوو پێشمەرگەش بریندار بوون بەناوی (عوسمان وەلی) کە دواتر لە قادر کەرەم ئەنفالکرا، (کەمال سدیق)، ئینجا سێ کۆپتەر دێیەکەیان بۆردوومان کرد، جارێکی تر سوپای پیادە هێرشی کردەوە دووبارە لەلایەن پێشمەرگەکانەوە پاشەکشەیان پێکرا، دوای ئەم شکانە پێنج کۆپتەر دابەزینە جەوەڵەکە دوای کەمێك هەڵسان بۆرەمی کردنی دێیەکەو تانك و زرێپوش بڵاوبوونەوە، لەو دیوەوە چواردەوری گوندی تازەشاریاندا. بەقسەی شایەتحاڵێك دەڵێت (٥٢) تانکم ژماردووە لەو کاتەدا[10]. ئاسۆ بیارەیی دەڵی (١٠٠) تانك و (١٥) کۆپتەرو (٥) فرۆکەی بیلاتوز ئاگریان بەسەر گوندەکەدا دەباراند[11].

سەنگەری پێشمەرگەکانیش لە شیووو دۆڵێکدابوو کە بۆ شەڕی ئاوەها قورس بەرگری کردن زۆر قورس و دژوارو نالەباربوو، جوگرافیای ناوچەکەش بۆ جەنگ یارمەتی دەرنەبوو، وەك ناوچە شاخاوییە بەرزەکانی تری کوردستان، لە ئەنجامی ئەم گەمارۆ دانەی تانك و هێزی پیادەو رەمی کۆپتەرەکان شەڕ هەر بەردەوام بوو تا کاتژمێر سێی ئێوارە. جوتیارێك بە میدڵ ئیست ووچی راگەیاندووە کە بەرادیۆی بێتەل گفتوگۆی فرۆکەکانی وەرگرتووە ووتویەتی گازی ژەهراوی تاقە رێگەیە بۆ لە ناوبردنی ئەم بەرگرییە[12]، بەقسەی شایەت گەلێکی زۆری بناری گل کەلەوکاتە لە هەردەکەوە چاویان لە شەڕەکە بووەو بینیویانە کۆپتەرێك سێ بۆمبی کردووەتە خوارەوە بۆ ناو دێیەکە دووکەڵی زەردو سپی لەم بۆمبانە هەڵساوە دواتر بەرگرییەکە نەماوەو ئەو ٢٢ پێشمەرگەی مابوونەوە شەهید بوون.

بڕوا وایە چەکی کیمیای بەکارهێنراوە لەشەڕی تازەشاردا، بەم شێوەیە بەرگرییەکە کۆتایی پێدێت، سوپا دەست دەکات بەرووخاندنی گوندەکان بە درێژای زنجیرە تەپۆڵکای جەوەڵ ناسار[13].

زۆربەی جار هەر لە کاتی ئەم رەمی کردنە خانووی گوندەکان ئەرووخا، ئەمە جگە لەوەی سوپا دواتر گوند بە گوندی لەگەڵ زەوی یەکسان دەکرد وتاڵانی دەکرد دوایش دەیسووتاند[14].

لە بەڵگەنامەیەکی رژێمدا بە ژمارە (١٠٣٣٤) لە رۆژی ١٠ی نیسانی ساڵی ١٩٨٨) کە بەنهێنی و بە پەلە نێردراوە بۆ ئەمنی دوزخورماتوو باس لە شەهید بوونی پێشمەرگەکانی تازە شار دەکات[15]. بەم شێوەیە هاووڵاتیانی بناری گل لە هەردەکەدا هیچ چارێکیان نەماوە سوپا راپێچی سەنتەرەکانی خۆ بەدەستەوەدانی کردن، هاوکات لەگەڵ هێرش و بڵاوبوونەوەی سوپا بە ناوچەکەدا کۆپتەرەکان لە ئاسمانەوە رەمیان دەکرد.

*** کۆکردنەوەی خەڵك و گواستنەوەیان و زەرەروزیانەکان:-**

بەگشتی لە گەرمیاندا چەند ناوچەیەکی سەرەکی هەبوو بۆ کۆکردنەوەی خەڵکە مەدەنییەکە، ئەو ناوچانەش " ملە سوورەو فەقێ مستەفاو مەیدان" لە باشووری گەرمیان، وە ئالیاوا ولە لەیلان"لە باکوور، ئەمانە ئەو سەنتەرانە بوون کە خەڵکیان لێکۆدەکرایەوە لەلایەن سوپاوە هەندێ جاریش سەیری ناسنامەیان دەکرد بەپەلە، دواتر بە ئیڤای سەربازی دەگوێزرانەوە بۆ بەندیخانەکان[16].

ئەگەر بەووردی باسی کۆکردنەوەو گواستنەوەی هاووڵاتیە مەدەنییەکانی بناری گل بکەین ئەوا بەپێ شوێنی جوگرافی ناوچەکە دەگۆڕێت، بەگشتی هاووڵاتیە مەدەنییەکان بۆ سێ جیاواز راگوێزراون ئەوانەش:

١- قادر کەرەم و ئالیاوە:

ئەو خەڵکەی باکووری رۆژهەڵاتی بناری گل کە لە هەردەکەدا بوون روویان کردە قادر کەرەم ئەمەش بە گوتەی جاش کە لەو ناوەدا بڵاوببونەوە بۆ خەڵکیان باسدەکرد ئەبێ خۆیان بەدەستەوە بدەن، لەم کاتەدا سوپا لەم قۆڵەوە خەڵکی کۆ نەکردەوە بەڵکو بە خەڵکەکەیان دەگوت بەرەو قادر کەرەم برۆن بۆ خۆبەدەستەوەدان، خۆشبەختانە لەم قۆڵەوە منداڵ و ئافرەت رزگاریان بوو، جگە لە پیاوەکان نەبێ کە خۆیان لە قادر کەرەم تەسلیم کرد لەگەڵ گوندەکانی تری ناحیەکەدا، بەرەبەرە هەموویان بارکران بەرەو باشووری عێراق[17]. لە تاریکی شەودا هەموویان خرانە چاڵی گەورەوە لەلایەن چەکدارەکانی رژێمی بەعسەوە دەسترێژیان لێ ئەکراو[18]. پۆل پۆل وەك باڵندەی سپی ئەکەوتنە چاڵەکانی بیابانی بانی عەرەبی بێکەڵکەوەو جارێکی ترنەبینرانەوە.

٢- نەوجول:

چەند دێیەك لە رۆژئاواو باشووری بناری گلدا روویان کردە باشووری رۆژئاوا بەرەو شارۆچکەی نەوجول بۆ خۆبەدەستەوەدان، بەڵام سوپا لەم قۆڵەوە خۆی خەڵکی کۆدەکردەوە، دەباز بوون لێرەدا زۆر زەحمەت بوو، بەتایبەتی گوندی عەزیز بەگ کە بەرەو نەوجول رۆیشتن بۆ خۆبەدەستەوەدان بۆی زۆربەی هەر زۆری گوندە کە ئەنفالکران بە منداڵ و ئافرەتەوە، بەقسەی شایتحاڵێك کە داواکاری فەرمی کردووە بۆ چارەنوسی منداڵەکانی کە (١٢) سەرخێزان بووە، لە بەڵگەنامەکانیشدا ئەم داواکاریە هاتووە[19].

حوسێن عەلی دەڵێت: لە پاش ئەوجول بەرەو دوزخورماتوو براون دواتر بۆ تکریت، حوسێن علی خۆی ئەم شوێنانە گەڕاوە بۆ سۆراغی خێزانەکەی وە لە تکریتیشەوە براون بۆ سەماوە لە سەماوەشەوە بۆ عەرعەر، لەوێ چارەنوسیان بە نادریاری ماوەتەوە، مام حوسێن دەڵێ: لەمە زیاتر سۆراغ کردنیان ڕووبەڕووی مەرگ دەبوویەوە بۆیە وازی لە گەڕان هێنا بەدوای منداڵەکانیدا[٢٠].

٣- ملە سوورە:

بەشێکی هاووڵاتی باشووری بناری گل ڕوویان کردە ملە سوورە بۆ خۆبەدەستەوەدان ئەمەش لە ژێر چاودێری سوپادا، دواتر گوێزرانەوە بۆ دوزخورماتوو[٢١].

بەگشتی ئەم سەنتەرانە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکیان تێدا کۆکرابوونەوە لە هەموو ناوچەکانی گەرمیان، بۆیە دەربازبوون لە ژمارەیەکی ئاوا زۆردا مەحاڵ نەبوو بە تایبەتی لە ئالیاوا و ملە سوورە، ژمارەیەکی زۆر لە منداڵ و ئافرەتی بناری گل ڕزگاریان بوو لەم سەنتەری کۆکرانەوە، بە تایبەتی لە "مرکز شباب" کەی توزخورماتوو[٢٢]، ژمارەیەکی زۆر کە نزیکەی (٦٠٠) نەفەر ڕزگاریان بوو، بۆیە ژمارەیەکی کەم لە منال و ئافرەت لە بناری گل ئەنفال کراوە بە بەراورد بە ناوچەکانی داودە و شوێنەکانی تری گەرمیان[٢٣].

* زەرەروزیانەکان:

ئەنفال هێرشێکی ڕاستەوخۆی هەمەلایەنە بوو بۆ سەر کۆی ژیانی کۆمەڵگایەك، بۆ کوشتن و بێ سەرو شوێنکردنیان وێران کردنی گوندەکانیان و سوتاندنیان وەتاڵانکردنی هەزارەها ئاژەڵ و پەلەوەرو وێرانکردنی هەموو بنەماکانی ژیان[٢٤]، ئەم هێرشە سەربازییەش بۆ سەر بناری گل زەرەرو زیانێکی گیانی و ماڵی زۆری لێکەوتەوە، (٥٨٢) کەس ئەنفال کراون (٤٤٤) خانوو (١٢) مزگەوت و (٨) خوێندنگە ڕووخێنراون، وە (٣٦٠٤٥) سەرمەڕوبزن و (٢١٠٥٦) پەلەوەرو (١٣٣٤) مانگا بەتاڵان براون، ئەمە جگە لە چەندین ئۆتومبیل و مەکینەو ماتۆڕی ئاو بە تاڵان براون و فەوتاون.

ژمارەیەکی زۆری ئاژەڵی تر لە ناوچووەو بە تاڵان براوە وەك کەروێشك، هەروەها زەرەرو زیان بە سروشتی ناوچەکە کەوتووە، جگە لە چەندین باخ و بێستان و کێڵگەی کشتوکاڵی لە بەروبومی گەنم و جۆو برنج و بامێ و تەماتەو پاقلە لە ناوچووە.

* سەرچاوەکان:-


١- میدڵ ئیست ووچ، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٩٠.

٢- ناهیدە تاڵەبانی و جاسم محمد، ئەنفالی گەرمیان، چاپخانەی ووشە، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٢، لا ٣١.

٣- جاسم محەمەد عەلی، ئەنفالی گەرمیان، چاپخانەی زانست، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٢، لا ٢٥.

٤- هەمان سەرچاوە لاپەڕە، لا ٢٩.

٥- هەمان سەرچاوە لاپەڕە، لا ٣٠.

٦- زیاد عەبدولرەحمان، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٠.

٧- چاوپێکەوتن لەگەڵ، مینا مەحموود عەلی، ١٢/ ١/ ٢٠٠٦.

٨- چاوپێکەوتن لەگەڵ مەجید ڕەشید سەلیم، ١٤/ ٢/ ٢٠٠٤.

٩- ئاسۆ بیارەیی، بناری گڵ گەرمیانی دڵ ئەنفالکراو، بەهاری ١٩٨٨، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان ژمارە (٦٨٦) ی ١٢/ ٤/ ٢٠٠٦، ل ٤.

١٠ چاوپێکەوتن لەگەڵ، مەجید ڕەشید سەلیم، ١٤ /٢/ ٢٠٠٦.

١١- ئاسۆ بیارەیی، سەرچاوەی پێشوو، لا ٤.

١٢- میدڵ ئیست ووچ، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٩٥.

١٣- عەبدوڵڵا کەریم مەحموود، سەرچاوەی پێشوو، لا ٨٨١ - ٨٨٣. بەڵام بەداخەوە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق کۆتەرمی ئەو پێشمەرگانە دەرهێنران لە گۆرستانی شەهیدان لە دوزخورماتوو نێژران بێ ئەوەی هیچ تاقیکردنەوەکەیان بۆ بکەن ئایا بە چەکی کیمیاوی کوژراوەن یان نە.

١٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ، محەمەد فەرەج نادر، ٧/ ٢/ ٢٠٠٦.

١٥- عەبدوڵڵا کەریم مەحموود، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٨١ - ٨٨٤.

١٦ میدڵ ئیست ووچ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦.

١٧- چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕەئووف مەجید مەرجان، کۆمەڵگای شۆڕش، ٢٨/ ١/ ٢٠٠٦.

١٨- یوست هێڵتەرمان، جینۆساید هاوتاوانی بێدەنگ بوون - عێراق و کوردەکان، وەرگێرانی: کاوە ساڵح، گۆڤاری ڕەهەند، ژمارە (٧)، ١٩٩٩، ل١٥.

١٩- زیاد عەبدولرەحمان، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦.

٢٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ، حوسێن عەلی ئەحمەد، ١٥/ ٢/ ٢٠٠٦.

٢١- چاوپێکەوتن لەگەڵ، مام عەلی خەڵکی گوندی کۆشکی گەورە، ٨/ ٢/ ٢٠٠٦.

٢٢- میدڵ ئیست ووچ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٦ -٢٣٠.

٢٣- چاوپێکەوتن لەگەڵ، شەریف محەمەد ئەمین، خەڵکی گوندی کانی قادر، ٨/ ٢/ ٢٠٠٦.

٢٤- مەریوان وریا قانع، ئەنفال و مۆدێرنە - ڕووداوێك لە دوامانەوە یان ئەگەرێك لە پێشمانەوە، گۆڤاری ڕەهەند، ژمارە (٧) ساڵی ١٩٩٩، ل ٣٢.

## * پرۆسەی ئەنفال لە ناوچەی شێخ بزێنی سەروودا.

قارەمان نادر شێخ بزێنی

پێش ئەنجامدانی پرۆسەی جینۆسایدکردنی نەتەوەی کورد لە ساڵی (١٩٨٨) حکومەتی عێراق لەنێو گێژاوێکی ئابووریو سیاسی و سەربازییەوە دەگوزەراند[1].

شەڕی هەشت ساڵەی نێوان حکومەتەکانی ئێران – عێراق (١٩٨٠– ١٩٨٨) هێزە ئابووریو مرۆییەکانی عێراقی شەکەت کردبوو، لە هەمان کاتدا بەرەیەکی یەکگرتووی کوردی لە باکوری وڵات لەنێو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد پێکهاتبوو، زۆرینەی پارتە کوردستانییەکان بڕیاریاندا بوو دژ بە دوژمن یەك هەڵوێست مامەڵە بکەنو ناکۆکییە دێرینەکانیان وەلابنێن، لەلایەکی تریشەوە تا دەهات هاوپەیمانیو هاریکاری نێوان بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو حکومەتی ئێران فراوانترو ڕەهەندی نوێترو سیتەماتیکتری بە خۆوە دەبینی[2].

ئەمەش حکومەتی عێراقو خودی سەدامی نیگەرانتر کرد بوو، بڕیاری کاردانەوەی توندی نالۆژیکی دەکرد[3].

بەمەبەستی خۆئامادەکردن بۆ شاڵاوەکانی جینۆسایدی نەتەوەی کورد حکومەتی عێراق بڕیاری ژمارە ١٦ی لە ٢٩ی ئازاری ساڵی (١٩٨٧) دەرکرد، کە تێیدا عەلی حەسەن مەجید دەستنیشان کرا بوو بە فەرماندەی تێکڕای هێزە سەربازیو ئەمنی و ئیدارییەکانی باکور[4].

عەلی حەسەن مەجیدیش هەموو ڕێکارە یاسایو نایاساییەکانی گرتە بەر لەپێناو سەرکوت کردنو لە باربردنی خەونی لە مێژینەی نەتەوەی کورد[5].

بۆ ئەو مەبەستە لە ١٧ی ئەیلولی ساڵی (١٩٨٧) بڕیاری سەرژمێری گشتی بە ئامانجی بەدەستهێنانی زانیاری ورد لە سەر دانیشتووانی ناوچە کوردنشینەکان ڕاگەیاندرا[6].

بەڵام لەم سەرژمێرییەدا دانیشتووانی لادێنشینەکان بەشداریان نەکرد، بەشێك لە دانیشتووانی شارو شارۆچکەکان لە ترسی ئەوەی نەکرێنە سوپای میللی (الجیش الشعبي) بە تایبەتی لەو سەردەمەدا ڕێژەیەکی زۆری خەڵکی ناوچەکە بە زۆر دەکرانە سوپای میللیو بەرەو بەرەکانی جەنگی ئێران – عێراق ڕەوانە دەکران[7].

حکومەتی عێراقیش بڕیاریدا هەموو ئەوانەی بەشداری ناکەن لەم پرۆسەیەدا لە ئیمتیازاتەکانی هاووڵاتی بوون بێ بەشیان بکاتو وەکو دوژمنی گەلی عێراق ئەژماریان بکات[8].

ئەوەی حکومەتی عێراقی نیگەرانتر بوو، زیاد بوونی ڕێژەی دانیشتووانی کورد بوو لە ناوچەکانی کەرکوكو دەوروبەریداو زیادکردنی ڕێژەی لەدایکبوونی منداڵی کورد بە شێوەیەك کە لە هەر (١٠٠٠) ژنێکی کوردا (٩٧٧) یان منداڵیان دەبێت، واتە ڕێژەی سەدیی منداڵبوون لەنێو ژنانی نەتەوەی کوردا ٧، ٩٧٪ بووە، بەڵام لە هەر (١٠٠٠) ژنێکی عەرەبدا تەنها (٩٢٢) یان منداڵیان دەبێت، واتە ڕێژەی سەدیی منداڵ لەنێو نەتەوەی عەرەبدا ٢، ٩٢٪ بووە، جیاوازی گەشەی دانیشتووان لەنێوان هەردوو نەتەوە بە ڕێژەی ٠، ٥٥٪ لە تێڕوانینی ڕژێمی بەعسدا جێگەی بایەخ پێدان بوو. جگ لەوەی گەنجەکانی کورد بەهۆی ناپاکیکردنو خۆفرۆشتن[9]. یان هەڵاتنیان لە بەرەکانی جەنگی ئێران – عێراقو خۆشاردنەوەیان لە ناوچە نیمچە ئازادکراوەکاندا گیانیان پارێزرا بوو[10].

کۆبوونەوەی ئەو ژمارە زۆرەی دانیشتووانی شارۆچکەو گوندە دوور دەستەکان ئەو ناوچانەیان قەرەباڵغ تر کرد بوو[11].

بارەگای هێزەکانی پێشمەرگەش لەم ناوچانەدا بوونو بەرگریان لە ناوچەکان دەکرد، لە بەرامبەریشدا حکومەتی عێراقی ئابلوقەی ئابووریو سەربازی خستبووە سەر ئەو ناوچانەو بەشێوەی بەردەوام بە بۆمبی دوورهاوێژو فرۆکە هێرشی بۆ سەر ناوچەکە دەکرد[12].

ناوچەی شێخ بزێنیش وەکو بەشێك لە باشووری کوردستان کە دەکەوێتە باکورو باکوری ڕۆژهەڵاتی پارێزگای کەرکوکەوەو (٣٥)کم لە شاری کەرکوکەوە دوورە بە شێوەی لاکێشەیی کەوتووەتە کەناری زێی بچووك، بەشێك لە گوندەکانی شێخ بزێنی سەروو (ئەسکەندەر بەگی، کانی بی، گەڵناغاج، شێخان، سەرچنار، جەلەمۆرد، توتەقەڵ، جوخلیجە، گردخەبەر، قەسرۆك) سەر بە ناحیەی ئاغجەلەرن، بەڵام گوندەکانی (قەرەناو، سماقە، قودرەتە، قامیشە، دارئەختیار) دەکەوێتە سنووری ناحیەی شوانەوە، لە شێخ بزێنی خوارووش گوندەکانی (جگیلە، کانی ڕەش، مەرزیخەی خواروو، مەرزیخەی سەروو، عەمدۆن، دەرمانأوی سەروو، پەڵکانە، شەوگێر، کاولەسوار، تورکی، قەرەسالم) دەکەوێتە سنووری ناحیەی شوانەوە، ئەم دەڤەرەش هاوشێوەی ناوچەکانی تری کوردستان لە ژێر چاودێری حکومەتو بۆردومانی بەردەوامدا بوو[13].

چەند ڕۆژێ بەرلەوەی پرۆسەی جینۆساید لە قۆناغی چوارەمی ئەنفال بگاتە سنووری شێخ بزێنی سەروو، هاووڵاتیە هەڵاتووەکانی گەرمیان کە لە پرۆسەی ئەنفالی گەرمیانو قەرەداغ ڕزگاریان بوو بەکۆڵە پشتێکەوە بە ناوچەکەدا دەسورانەوەو باسی ئەو کارەساتەیان دەکرد، کە بە سەر ناوچەکەیاندا هاتبووە، هەرچەندە ئاگادار نەبوون لە گەورەیی قەبارەی ڕووداوەکە، ئەو ڕۆژانە کۆپتەرو فرۆکەی مێكو پلاتۆزەکان بە شێوەیەکی بەرز بە ئاسمانی ناوچەکەدا دەسورانەوە، لە پێش نیوەڕۆی ڕۆژی (٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٨) چەند فرۆکەیەك بە دەنگێکی بەرز دەرکەوتن[14].

پاش چەند خولەکێك دەنگی چەند بۆمبێك بە شێوەیەکی نزم بیستران، لە بەر بەرزی دەنگی فرۆکەکان دەنگی بۆمبەکان بە نزمی دەبیستران، پاشان دووکەڵێکی سپی لە ئاست گوندی عەسکەرو گۆپتەپە بەرەو ئاسمان بەرز بووە[15].

پاش چەند کاتژمێرێك زانرا ئەو دوکەڵە چەکی کیمیاوی بووە لە دژی هاووڵاتیانی گوندی گۆپتەپەو عەسکەر بەکارهاتووە، ئەمەش سەرەتای دەستپێکی ئەنفالی چواروو ئەنفالی گوندەکانی شێخ بزێنی سەروو بوو[16].

لەم سەروبەندەدا بە پیلانێکی بەرنامە بۆدارێژراو بە شێوەیەکی فراوان ئاوی زێی بچووك بەردرابۆوە، بۆ ئەوەی ئاستەنگ بخاتە پێش هاتووچۆی هاووڵاتیان لە شێخ بزێنیەوە بۆ دەشتی کۆیە یان بە پێچەوانەوە، لەو کاتەدا تەرمی چەند هاووڵاتیەك لە ژن و منداڵ لە زێی بچووکدا بینران، دەورو پشتی چاویان رەش هەڵگەرابوو لاشەشیان رەق بوو، ئەمانە لە ترسی چەکی کیمیاوی لە گوندی گۆپتەپە هەڵاتبوون و لە زێیەکەدا خنکا بوون[١٧].

رۆژی دوای ئەم کارەساتە سوپای حکومەتی عێراق کۆنترۆلی گوندی گۆپتەپەی کردو لاشەی کوژراوانی کیمیابارانی بە شۆفل کردە ژێر زەوییەوە بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی بڵاوبونەوەی نەخۆشی و مەترسی بۆ سەربازەکانی[١٨].

لە رۆژی (٤ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٨) لە چەند قۆڵێکەوە هێرشی کردە سەر ناوچەی شێخ بزێنی سەروو:

قۆڵی یەکەم: لە رۆژهەڵاتی ناوچەکەوە بۆ رۆژئاوا واتە لە چەمچەماڵ و قەرەهەنجیرەوە بەرەو گوندەکانی کانی هەنجیر، سەرچنار، گەڵناغاج، چوخلیجە، گرد خەبەر.

قۆڵی دووەم: لە رۆژئاواوە بە ئاراستەی رۆژهەڵات بە تایبەت گوندەکانی قەرەناو، کەپەنك، سماقە، تۆتەقەڵ، دار ئەختیار، قەسرۆك، گردخەبەر[١٩].

هێزەکانی هەردوو قۆڵی سوپای حکومەت لە گوندی گردخەبەر بە یەك گەیشتن[٢٠].

لەو هەلومەرجە نالەبارەدا بەشی زۆری دانیشتووانی ناوچەکە بە تولەرێیەکاندا بەرەو قەدپاڵ و ئەشکەوت و شاخ و نێو رەزو دارستانەکانی کەناری زێی بچووك هەڵدەهاتن بەمەبەستی خۆحەشاردان[٢١].

هەڵبەتە لە رۆژی (٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٨) چەند پێکدانێك لەنێوان هێزەکانی پێشمەرگەو سوپای عێراقدا لە ناوچەی چەمی رەزان (چەمی رێزان) نزیك لە شەقامی سەرەکی دووکان – سلێمانی روویدا، دوای چەند کاتژمێرێك لە پێکدادان نەتوانرا رێگە لە پێشرەوییەکانی سوپای حکومەتی عێراق بگیرێت[٢٢].

ئەو رۆژانە خەڵکی لە چاوەروانی یەکلاکردنەوەی چارەنوسیاندا بوون، هەواڵەکان لە شاروشارۆچکەکان و سەنگەر (رەبیە)ی خۆفرۆشەکانەوە دەگەیشتنە خەڵکی لادێکان کە بە هەر شێوەیەك بێت خۆیان دەرباز بکەن و ئایندەیەکی مەترسیدار چاوەروانی دانیشتووانی ناوچەکە دەکات و باسی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دەکراو بارێکی دەروونی ئاڵۆزی دروست کرد بوو[٢٣].

بەڵام بەشێك لە کادیران و هێزەکانی پێشمەرگە رێگەیان لە هەڵاتنی خەڵکی ناوچەکە گرت و نەیاندەهێشت ناوچەکە چۆڵ بکەن و هەڵبێن و هەوڵیان دەدا ورەی دانیشتووانی ناوچەکە بەرز بکەنەوەو باسیان لە گفتوگۆ یان شکاندنی حکومەتی لە چەند قۆڵێکەوە دەکرد[٢٤].

لەبەرەبەیانی رۆژی (٤ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٨) رۆژ بە دەنگی تۆپ و دەنگی فرۆکەو دەبابەکانی سوپای عێراق کرایەوە، پاش چەند کاتژمێرێك زنجیرەی ئۆتۆمبیلە سەربازییەکان دەرکەوتن و کۆپتەرو تەیارەکانیش لە ئاسمانی ناوچەکە دەسوورانەوەو ئۆتۆمبیلی خۆفرۆشەکانیش لە پێشەوەی سوپا هەڵمەتیان دەهێنا[٢٥].

دانیشتووانی ناوچەکە لەنێو قامیشەڵان و کەندو دۆڵەکاندا بوون، ئەو هاووڵاتیانەی پێشوتر بەهۆی جیاوازی چینایەتییەوە دانویان پێکەوە نەکوڵاو پێکەوە هەڵیان نەدەکرد لە پاڵ یەکتردا بە بێدەنگی دانیشتبوون و چاوەروانی چارەنوسیان دەکرد، بیریان لە هیچ نەدەکردەوە جگە لە رزگار بوون نەبێت[٢٦].

بەشی زۆری پێشمەرگەکانیش ناوچەکەیان چۆڵ کردو بەرەو سنوورەکانی ئێران – عێراق پاشەکشەیان کرد[٢٧].

ئەمەش زەمینەی رەخساند بۆ ئەوەی سوپا جۆراوجۆرەکانی حکومەتی عێراقی بێ مەترسی و بەرەنگاربوونەوە گوند بە گوندی ناوچەکە بسوتێنن، بێ ئەوەی هیچ ئاستەنگێك بێتە رێیان، پاش ئەوەی گوندەکانیان سوتاندو خاپوریان کرد ئەو کەسانەی بە تاك تاك بەهۆی پیری یان منداڵ و ژنان لە گوندەکان مابونەوە دەستگیر کران، دواتر جاشەکان بە دۆڵ و قەدپاڵ و شاخەکاندا بڵاوەیان کردو زۆرینەی خێزان و ژن و منداڵە هەڵاتووەکانیان دۆزیەوە بە شانازییەوە رادەستی سوپای عێراقیان کردن[٢٨]. هەر جارەو هەواڵی بە کۆمەڵ دەستگیرکردنی گوندێك دەبیسترا[٢٩].

سەرەرای ئەوەی جاشەکان شارەزای باشیان لە ناوچەکە هەبوو، دڵسۆزانە هەموو توانایان بۆ دۆزینەوەی هاونەتەوەکانیان خستبووە گەرو پێشبرکێیان دەکرد لە خۆبردنە پێشەوە، لە رێگەی فرۆکەوە بە بڵند گۆ بانگەوازیان بۆ خۆبەدەستەوەدانی دانیشتووانی ناوچەکە دەکرد، دیارترین ئەو کەسانەش (قاسم ئاغای کۆیە) بوو کە داوای لە خەڵکەکە دەکرد لەسەر شەرەفی ئەو، خۆیان رادەست بکەن گیانیان پارێزراو دەبێت، ئەمەش کاریگەری لەسەر دەروونی خەڵکی ناوچەکە دروست کرد، بە تایبەتی ئەو کەسانەی لە چینی ئاغاکان بوون، لایان وابوو لەژێر کاریگەری چینایەتیدا قاسم ئاغا راستگۆیەو دەیانپارێزێ، بەڵام تێکرایانی رادەست بە سوپای عێراق کرد[٣٠].

بەشێکی تری دانیشتووانی ناوچەکانی شێخ بزێنی سەروو بە ئۆتۆمبیل و تراکتۆرەکانیان بەرەو رۆژئاوا بە ئاراستەی شارۆچکەی تەق تەق هەڵاتن، بێ ئەوەی ئاگادار بن لەوەی کە لەوێشەوە سوپای حکومەتی عێراقی هێرشی هێناوە، لە گوندی قامیشە زۆربەی دانیشتووانی ناوچەکە کەوتنە نێو سوپای عێراقییەوەو تەواویان دەستگیر کران[٣١].

بەم شێوەیە لە ماوەی سێ رۆژدا تەواوی ناوچەکە لە هێزە مرۆیی و مادییەکان راماڵدرا، مۆڵگەو سەنگەر (رەبییە)ەکانی سوپای لێ دامەزرێنەرا بۆ ئەوەی رێگە بگرن لە گەرانەوەی هێزی پێشمەرگەو پاشماوەی دانیشتوانەکەی بۆ زێدی خۆیان.

*** ئایندەی دەستگیرکراوەکان.**

دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆری دانیشتووانی ناوچەکەیان دەستگیرکردن و بەرەو شوێنی جیاوازیان بردن بەم شێوەیەی خوارەوە:

یەکەم: زۆرینەی ئەو خەڵکانەی لەلایەن ئەو هێزانەی کە لە ئاغجەلەرەوە هاتبوون دەستگیرکران بە تایبەت گوندەکانی کانی هەنجیرو سەرچنارو گەڵناغاج و جەلەمۆرو چوخلیجەو بەشێك لە گوندی گردخەبەریان بەرەو کۆمەڵگایەکی سەربازی شارۆچکەی چەمچەماڵ گواستەوە[٣٢].

لەو سەربازگەیەدا بەشێك لە دەستگیرکراوەکان ئازاد کران تاکو ببێتە هاندەر بۆ ئەو هاووڵاتیانەی تا ئەو کاتە خۆیان نەدابوو بە دەست هێزەکانی حکومەتەوەو درێژەیان بە خۆحەشاردان دابوو[٣٣].

دووەم: ئەو هاووڵاتیانەی کە لە گوندەکانی رۆژئاوای شێخ بزێنی سەروو دەستگیرکران بە تایبەت گوندەکانی قامیشە، دارئەختیار، قەسرۆك، توتەقەڵ، کەپەنك، گردخەبەرو بەشێك لە خەڵکی چوخلیجە گواسترانەوە بۆ کۆمەڵگای سەربازی قەڵاتە لە بەرامبەر شارۆچکەی تەق تەق[٣٤].

سێیەم: بەشێکی تری دانیشتووانی نێوچەکە کە خۆیان رادەستی خۆفرۆشەکان و سوپای عێراق کردبوو، بەتایبەتی ئەوانەی لە زێی بچووك پەرینەوە تاکو خۆیان بگەیەنە قەزای کۆیە، بەڵام دەستگیر کران و بەرەو قەڵای سەبازی ئامریە لە گوندی هەرمۆتەی مەسیحی نشینی نزیك لە شاری کۆیە گواسترانەوە[٣٥].

کاتێك دەستگیرکراوەکان لە سەربازگەکانی قەڵاتە لە نزیك شارۆچکەی تەق تەق و قەڵای هەرمۆتە نزیك شاری کۆیە کۆکرانەوە لەلایەن خەڵکی ناوچەکەوە هاوکاری و یارمەتی لە خواردن و خواردنەوە پێشکەش بە گیراوەکان کران، هەوڵەکان لەپێناو رزگارکردنیان خرایە گەڕ، توانرا چەند دەستگیرکراوێك رزگاربکرێت لە رێگەی بە بەخشینی پارە بە سەربازو خۆفرۆشەکان، لایەنێکی تری هەوڵەکان هەوڵدانی بەشێك لە مامۆستایانی ئاینی شاری کۆیەو تەق تەق بوو کە داوای ئازاد کردنی گیراوەکانیان لە ئەفسەرانی سوپا دەکرد، بەڵام بێسود بوو، بە ئۆتۆمبیلی سەربازی تێکرایان بۆ کۆمەڵگای سەربازی تۆبزاوەی خوارووی شاری کەرکوك گواسترانەوە[٣٦]. پاش گەیشتنی دەستگیرکراوەکان بۆ کۆمەڵگای تۆبزاوە، لەوێش جگە لە ئازاردانی دەروونی و جەستەی و روشاندنی رەوشتی مێینەکان چەندان منداڵ و پیر پەککەوتە لە برساندا مردن[٣٧].

دواتر هەستان بە جیاکردنەوەی ژن و منداڵ و پیرو گەنجەکان لە یەکتری هەر بەشێکیان بۆ شوێنێکی دیاریکراو رەوانە کرد، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- پیاوەکان بۆ فەرماندەی فەیلەقی یەك لە رۆژئاوای شاری کەرکوك و سنووری دەگەیشتەوە ناو کەرکوك بگوازرێنەوە.

٢- ژنەکان بۆ فەرماندەی فەیلەقی سێ بگوازرێنەوە.

٣- منداڵەکان بۆ سەربازگەی مەشقی تانکەکان بگوازرێنەوە لە تکریت[٣٨].

پاشان بەشێکیان گواستەوە بۆ ناوچەکانی نوگرەسەلمان و عەرعەر لە باشووری عێراق و ئەوانەی تریان بە شۆفڵ و حەفارە بە شێوەیەکی زۆر درندانەو دوور لە هەموو بەهایەکی مرۆڤایەتی خرانە ژێر زەوییەوە، بۆ نموونە یەکێك لەو کەسانەی کە ژمارییەك لە دەستگیرکراوانەی بە حەفارەکەی داپۆشیوە ناوی (عبدولحەسەن مۆحان موراد)ە کە سەر بە دەزگاکانی ئەمنی تایبەت بوو، دەڵێ لە ئەنفالەکاندا ژنێکی بە رەگەز عەرەبم بینی خێزانی پێشمەرگەیەکی حیزبی شیوعی بوو زۆر نیگەران بووم لەوەی کوشتیان، بەڵام پەشیمان نیم لەو کارەی دژ بە کوردەکان کردوومە[٣٩].

لە کاتێکدا هەزاران خێزانی کورد جینۆساید دەکرێن و بە کۆمەڵ دەخرێنە ژێر زەوییەوە تەنانەت دوای چەندین ساڵ عەبدولحەسەن پەشیمان نیە لەو کارەی کردویەتی، لە کاتێکدا زیاتر لە (٣٠٠٠) هەزار منداڵ لە تۆبزاوە لە برساندا مردن[٤٠]. ئەمەش بە ئایدۆلۆژیەتێکی مەترسیداری دەزانم.

* خشتەی ئاماری ئەنفالکراوانی گوندەکانی شێخ بزێنی سەروو[٤١].

| ناوی گوند | ژمارەی ئەنفالکراوە |
|---|---|
| قەرەناو | ٧٨ |
| سماقە | ٦٢ |
| قودرەتە | ١٣ |
| قامیشە | ٣٣ |
| قەسرۆك | ٢١١ |
| گردخەبەر | ٢٠٠ |
| چوخلیجە | ١١٤ |
| توتەقاڵ | ١٣٤ |
| جەلەمۆرد | ٣٧٨ |
| سەرچنار | ١٤١ |
| شێخان | ٩٥ |
| گەڵناغاج | ٦١ |
| کانی بی | ٩٥ |
| ئەسکەندەر بەگی | ٣٦ |
| کۆی گشتی | ١٦٨٠ |

*** ئەنفال لە شێخ بزێنی خواروو.**

هەڵمەتی جینۆسایدکردن لە شێخ بزێنی خواروو، بە ڕۆژێك دوای شێخ بزێنی سەروو، واتە لە ڕۆژی (٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٨) لە چەند قۆڵێکەوە بۆ ناوچەکە دەستی پێکرد[٤٢] بەم شێوەی خوارەوە:

قۆڵی یەکەم: هێزەکانی سوپای عێراقی بەشێوەیەکی فراوانو بە پشتیوانی هێزە ئاسمانییەکانی عێراق لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا جوڵەیان کرد، پێشڕەوییەکان بە دوو ئاراستە دەستی پێکرد:

١- لە ناحیەی تەقتەقەوە بۆ گوندی جگیلەی ناوچەی شێخ بزێنی خواروو.

٢- لە ناحیەی شوانی کەرکوکەوە بۆ گوندەکانی شێخ بزێنی خواروو بە تایبەتی گوندەکانی کانی ڕەش، مەرزیخەی خواروو مەرزیخەی سەروو، عەمدۆن، دەرماناو سەروو، پەڵکانە، شەوگێر.

قۆڵی دووەم: لە ناحیەی (پردێ)وە بە ئاراستەی ڕۆژهەڵات، بەتایبەت گوندەکانی دەرمان خواروو، قەرەسالم، کاولەسوار، تورکی[٤٣].

لەم پرۆسەیەشدا سوپای عێراقی جیاوازی لەنێوان چەکدارو هاووڵاتیو ژنو پیاوو منداڵ نەدەکرد، هەر کەسێك دەستگیر دەکرا بە دڕندانەترین شێوە مامەڵەی لە گەڵ دەکرا[٤٤].

هەمان شێوەی جینۆسایدکردنی ناوچەکانی تر خۆفرۆشەکان ڕۆڵی نێگەتیڤیان بینی لە کۆنترۆڵکردنی ناوچەکەو ئەو هاووڵاتیانەی کە لە دۆڵو لاپاڵەکاندا خۆیان حەشاردا بوو دەریان دەهێنانو ڕادەستی سوپای عێراقیان دەکردن[٤٥].

بە بەراوردی ناوچەکانی تر ئەم ناوچەیە بە تایبەت شێخ بزێنی سەروو کەمتر دانیشتووانەکەی دەستگیر کران، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند فاکتەرێك کە ڕۆڵیان لە ڕزگارکردنی خەڵکی ناوچەکەدا هەبوو، وەك:

یەکەم: بەهۆی ئەو دەنگوباسو هەواڵانەی کە لایەن ئەو هاووڵاتیانەی لە گەرمیانو قەرەداغ هەڵات بوون، ئاگاداری دانیشتووانی ناوچەکەیان کردەوە کە خێزانەکان ڕزگار بکەن، بەشی زۆری دانیشتووانی شێخ بزێنی خواروو ژنو منداڵەکانیان دەرباز کردو گەیاندیانە شارو شارۆچکەو کۆمەڵگا زۆرە ملێیەکان[٤٦].

دووەم: هەواڵەکان بە زوویی لە شارو شارۆچکەکانەوە دەگەیشتە گوندەکان لە پێشهاتی مەترسیدار ئاگادار دەکرانەوە، داوایان دەکرد هەرچی زووە ژنو منداڵەکان دەرباز بکەن[٤٧].

سێیەم: بەشێکی زۆری دانیشتووانی شێخ بزێنی خواروو لە ڕێگەی زێی بچووکەوە پەڕینەوەو خۆیان گەیاندە ناوچە دوورە دەستەکانو ئەوشوێنانەی ئەستەم بوو ئۆتۆمبیلەکانی سوپا بگاتە ئەو حەشارگانە[٤٨].

چوارەم: گوندەکانی شێخ بزێنی سەروو ڕۆژی زووتر ئەنفال کرانو دەنگی بۆمب تۆپەکان دەبیسترا، بۆیە دانیشتووانی ناوچەکە توانیان خۆیان لە ئابڵوقەکە ڕزگار بکەن[٤٩].

پێنجەم: هێزەکانی پێشمەرگە لە شێخ بزێنی سەروو ڕێگریان لە هەڵاتنی دانیشتووانی ناوچەکە گرتبوو، بەڵام لە شەوی ٣/٤ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٨ لە شێخ بزێنی سەروو پاشەکشەیان کردوو بەرگریان لە ناوچەکە نەکرد، ئەم شێوازە مامەڵەیە لۆجستی سوودیان لێوەربگرن، بەڵام کاتێك زانرا هێزی پێشمەرگە لە شێخ بزێنی سەروو پاشەکشەی کردووەو سوپای حکومەت ئامادەیە لە هەر شوێنی بەرگری بکرێت بە چەکی کیمیاوی هێرشی دەکاتە سەر ناوچەکە، لە شێخ بزێنی خواروو هاوکاری دانیشتووانی ناوچەکەیان کرد تا لە چنگی سوپای عێراقی ڕزگاریان بێت[٥٠].

شەشەم: بەشێك لە سەرۆکە خۆفرۆشەکانو مەفرەزە تایبەتییەکانی سەر بە حکومەتی عێراقی لەژێر کاریگەری خزمایەتی یان هەستی نەتەوەییو نیشتمانی هاوکاری دەرباز کردنی خەڵکەکەیان کرد[٥١].

بەم شێوەیە ڕێژەی قوربانیانی جینۆسایدی دانیشتووانی شێخ بزێنی خواروو بە بەراورد بە شێخ بزێنی سەروو کەمتر بوو، بەشێك لە خەڵکانەی دەستگیرکران هەر لەو کاتەدا گوللەباران کرانو بەشێکی تریان بۆ سەربازگەی تۆبزاوەی خواروو هات، کە تێیدا (٩٢) کەس ئەنفال کران[٥٢].

*** خشتەی ئاماری ئەنفالکراوەکانی شێخ بزێنی خواروو[٥٣].**

| ناوی گوند | ژمارەی ئەنفالکراوەکان |
|---|---|
| قەرەسالم | ٢٩ |
| تولکی | ١٢ |
| دەرماناو خواروو | ٧ |
| شەوگێر کاولەسوار | ١٢ |
| جگیلەو کانی ڕەش | ٨ |
| دەرماناوو پەڵکانە | ١٣ |
| مەرزیخەی خواروو سەروو | ١١ |
| کۆی گشتی | ٩٢ |

*** ئەنجام:**

لەم توێژینەوەیەدا گەیشتینە ئەم دەرئەنجامانەی خوارەوە:

١- پرۆسەی ئەنفال کە لە زنجیرە شاڵاوێکی جینۆسایدکردنی نەتەوەی کوردبوو ئەنجامدرا، بەمەبەستی تێکشکاندنی ژێر خانی ئابووریو مرۆیی، کە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە بوارە جیاجیاکاندا پشتی پێدەبەست، بەمەش گوندەکان خاپوور کران، دانیشتووانی ناوچەکان راپێچی مردن کران یان بۆ کۆمەڵگای زۆرە ملێکان رایانماڵین. ئەمەش لە سنوورێکی پانو بەرینی کوردستاندا ئەنجام دراو لە گەشەی مرۆڤایەتی داماڵێنرا، بێ ئەوەی گوێ بە هیچ بەهایەکی مرۆڤایەتیو پرەنسیپو یاسا نێودەوڵەتییەکان بدرێت، هەزاران مرۆڤی سڤیل بەرەو مەرگ رەوانە کران.

٢- ئەنفال برینێکی قووڵی لە بونیادی دەروونی و کۆمەڵایەتی تاکی کوردا دروست کرد، بە تایبەتی ئەوانەی لە پرۆسەکە رزگاریان بوو یاخود حکومەتی عێراق خۆی ئازادی کردن، یان لە گوندەکان دەرباز بوون، بە دەروونێکی پڕ لە ئازارەوە دایکان لە چاوەروانی نەوەکانو خێزانەکان لە چاوەروانی منداڵو هاوسەرەکانیان بوون، بەشێکیان بەو چاوەروانییەوە کۆچی دوایان کردو بەشێکی تریان تا ئێستاش لەو بروایەدا نین کە خۆشەویستانیان کۆمەڵکوژ کرانو نەماون.

٣- حکومەتی عێراق بە بەرنامەیەکی تۆکمەی پلان بۆ دارێژراو، دەیویست هەژموونی کورد لە عێراقدا کەمبکاتەوە، بە تایبەتی ئەو ناوچانەی هێزی ئابووریان کاریگەرە، وەك کەرکوك، نەتەوەی کوردی تێدا هاوتا بکرێتو تا کەمتریان بکات لە رەگەزی عەرەبدا، بۆیە لە هەر دەفەتێك دەگەڕا بۆ ئەنجامدانی ئەو قرکردنە. هەروەکو لە وتارێکی عەلی حەسەن مەجیدا دەردەکەوێت کە بە بۆنەی دەست بەکار بوونی (حەسەن عەلی ئەلعامری) لە (١٥ حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٩) دا وەکو بەرپرسی حیزبی لە باکوری وڵات هاتبوو دەڵێ: (کە من هاتم رێژەی عەرەبو تورکمان ٥١٪ بوو بەڵام دوای ئەوەی شەش ملیۆن دینارم خەرج کرد ئینجا رێژەکە گەیشتە ٦٠٪، پاشان ئاگاداری هەموو هێزەکانم کردەوە هەر کوردێکتان بە هەر بیانویەك گرت دەتوانن بێ دوو دڵی بیکوژن). ئەگەر ئەمە جینۆساید نەبێ دەبێ چ ئاکارو مامەڵەیەك بە جینۆساید بناسێنرێت؟؟!!

٤- بەهۆی کاریگەری پرۆسەی ئەنفالەوە تا ئێستاش نەتوانراوە گوندەکانی شێخ بزێنی ئاوەدان بکرێتەوە، ژمارەیەکی زۆر کەم دانیشتووانی ناوچەکە گەراونەتەوە سەر زێدی خۆیان.

٥- ئەم پرۆسەیە (١٧٧٢) هاوولاتی ناوچەکەی کردە قوربانی و تاکو ئێستاش هیچ شوێنەوارێکیان دەرنەکەوتووە.

*** سەرچاوەکان**


یەك: سەرچاوەی کتێب بە زمانی کوردییەکان.

١- ئاسۆ حەسەن: دووڕێیانی مەرگو ژیاندا، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧.

٢- ئیدریس ئۆمەگومەتی: ئەنفالی زێی بچووك، سلێمانی، ٢٠١٣.

٣- دەرسیم دیبەگەیی: ئینسکلۆپیدیای تاوانەکانی ئەنفالو کوردۆسایدکردنی گەلی باشووری کوردستان، هەولێر، ٢٠١١.

٤- زەمان عەبدە: مەرگەساتی ئەنفال، چاپی یەکەم، بەرگی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٠.

زیاد عەبدولرەحمان: تونی مەرگ، چاپی دووەم، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٥- عارف قوربانی: لە ئوم رێحانەوە بۆ تۆبزاوە ئەو شۆفێر شۆفلەی کە بەشێك لە ئەنفالکراوەکانی داپۆشی، چاپخانەو ئۆفسێتی ئارابخا، کەرکوك، ٢٠٠٤.

٦- عارف قوربانی شایەتحاڵەکانی ئەنفال: ب٣، سلێمانی، ٢٠٠٧.

٧- عەلی مەحمود: کوردۆساید، چاپخانەی رۆمان، سلێمانی، ٢٠٠٨.

٨- عەبدوڵڵا کەریم مەحمود: رەشەبای ژەهرو ئەنفال، ب٢، هەولێر، ٢٠٠٣.

٩- لەتیف فاتح فەرەج: جینۆسایدو کاڵبوونەوە، چاپخانەی کارۆ، هەولێر، ٢٠٠٤.

١٠- مارف عومەر گوڵ: جینۆسایدی گەلی کورد لەبەر رۆشنایی یاسایی نێودەوڵەتیدا، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٣.

١١- مارف عومەر گوڵ: پۆلێن کردنی تاوانەکانی ئەنفال بە پێی جۆرەکانی جینۆساید، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەب وشیاری (ی. ن. ك)، سلێمانی، ٢٠٠٠.

١٢- مایکل لیزنبێرگ: ئەنفال لە کوردستانی عێراق، کارزان محەمەد، سلێمانی، ٢٠١١.

١٣- میدڵ ئیست وۆچ: جینۆساید لە عێراقداو پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کوردو: محەمەد حەمە سالح تۆفیق، چاپی دووەم، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٤.

١٤- مەحموود سەنگاوی: جاشو جینۆساید، چ٢، چاپخانەو پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٧.

١٥- یوسف دزەیی: ئەنفال، کارەسات، ئەنجامو رەهەندەکانی، چاپخانەی موکریان، سلێمانی، ٢٠٠١.

* سەرچاوەکان بە زمانی عەرەبییەکان.

١٦- جید جیرارد جالدیان: الماسات الكردية، عبد السلام النقشبندي، گ١، اربيل، ٢٠٠٧.

١٧- محەمەدی کوڕی ئیدریس شافعی (٧٦٧- ٨٢٠ن): احكام القرآن للشافعي، ج١، اسكندريە، ١٩٨٢.

١٨- سيد قطب: في ظلال القرآن مجلد ٣، الاجزاء (٨- ١١)، دار الشروق، مصر، ١٩٨٢.

١٩- شۆڕش حاجی رسول: انفال الكورد ودولة العراق، چ٢، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥.

٢٠- محمد بن الجریر الطبري: تأریخ الطبري، ج٢.
٢١- ملا شاخی: انفالی خالخالان، ت: نەوزاد مەحمود حەمید، کرکوك، ٢٠٠٦.
٢٢- منظمة حقوق الانسان/ شرق الاوسط: جریمة العراق في الإبادة الجماعیة، حملة الانفال ضد الکرد، ت: جمال میرزا عزیز، سلێمانی سلێمانی، ٢٠٠٣.
* گۆڤارەکان:
٢٣- میدڵ ئیست ووچ: ڕێخۆشکردن بۆ ئەنفال، و سیامەند موفتی زادە، گۆڤاری هزر، ژمارە (٣)، ١٩٩٩.
* نامەی زانستی.
٢٤- یادگار عبدوڵڵا هەمەوندی: ڕەهەند سیاسییەکانی پرۆسەی ئەنفال لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا، نامە ماستەرە پێشکەش بە کۆلیژی زانستە کۆمەلاًییەتییەکانی زانکۆی کۆیە کراوەو بلاًونەکراوەتەوە، ٢٠٠٨.
* ئەلیکترۆنییەکان.
٢٥- ئاسۆ شوانی: گوندی جەلەمۆرو ئاغجەلەر بۆنی ئەنفالیان لێ دێ، لە ٢٠٠٨. www. Awene. Com
* چاوپێکەوتنەکان لەگەڵ
٢٦- ئاسۆ سور لە گوندی قەرەناو/ ناحیەی شوان ٢٠١٣/٢/٢٣
٢٧- ئەیوب ڕەشید لە گوندی قەرەناو/ ناحیەی شوان ٢٦/ ١/ ٢٠١٣.
٢٨- ڕەمەزان نادر لە شاری کەرکوك ٢٥/ ١/ ٢٠١٣.
٢٩- جەلال مەولود، تەق تەق لە ٢٦/ ١/ ٢٠١٣.
٣٠- خالیدی حاجی ئەحمەدی بۆگد، لە شاری کۆیە، ٢٥/ ١/ ٢٠١٣.
٣١- کاکە خان نەسرەدین لە ناحیەی تەق تەق ٢١/ ١/ ٢٠١٣.
* پەراوێزەکان:-
١- مایکل لیزنبێرگ: ئەنفال لە کوردستانی عێراق، و: کارزان محەمەد، ئەکادیمیای هۆشیاریو پێگەیاندنی کادیران، سلێمانی، ٢٠١١، ل ٨- ٩.
٢- لەتیف فاتح فەرەج: جینۆسایدو کالبوونەوە، چاپخانەی کارۆ، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ١٠٠ - ١٠١، مایکل لیزنبێرگ: هـ. س. پ، ل١٣.
٣- مەحموود سەنگاوی: جاشو جینۆساید، پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل١٩، مایکل لیزنبێرگ: هـ. س. پ، ل٩.
٤- منظمة حقوق الانسان/ شرق الاوسط: جریمة العراق في ابادة الجماعیة، حملة الانفال ضد الکرد، ت: جمال میرزا عزیز، سلێمانی ٢٠٠٣، ص ٤٥١.
٥- مەحموود سەنگاوی: س. پ، ل١٩، ئیدریس ئۆمەر گومەتی: ئەنفالی زێی بچووك، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠١٣، ل١٢١.
٦- مایکل لیزنبێرگ: س. پ، ل١٢.
٧- چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا کاکەخان نەسرەدین، تەق تەق، ٢٠١٣/١/٢١ (کاکەخان خان نەسرەدین، لە ساڵی (١٩٥٤) لە گوندی قەسرۆکی سەر بە پارێزگای کەرکوك لەدایکبووە، بڕوانامەی ماستەری لە خوێندنی ئاینی بە دەست هێناوە، ئێستا مامۆستایە لە زانکۆی کۆیەو دانیشتوی شارۆچکەی تەق تەق، خاوەنەوادەکەی (٥٢) ئەنفالیان هەیە.
٨- مەبەست لەو زاراوەیە جاشە کە لەنێو خەڵکی کوردستاندا ناسرا بوون، بەلاًم حکومەتی عێراق بە فرسان ناوی دەبردن (تویژەر).
٩- یوسف دزەیی: س. پ. ل٢٥.
١٠- زیاد عەبدولڕەحمان: تونی مەرگ، چاپی دووەم، سەنتەری لێکۆلینەوەی ستراتیجی، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٩.
١١- منظمة حقوق الانسان: م. س، ص ١٤٣- ١٤٤.
١٢- ملا شاخی: انفالی خالخالان، نەوزاد مەحمود حەمید، کرکوك، ٢٠٠٦، ل ٢٢٢، ٢٢٣.
١٣- عەلی مەحمود: کوردۆساید، چاپخانەی ڕۆمان، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل ١٦.
١٤- شۆرش حاجی رسول: انفال الکورد ودولة العراق، ج٢، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥، ص١٠٨، عەلی مەحمود: س. پ. ل١٦. منظمة حقوق الانسان: م. س، ص ٢٢٢- ٢٢٣.
١٥- ملا شاخی: م. س، ص ٢٥، چاوپێکەوتن لەگەڵ وەستا جەلال ئەحمەد مەولود، ٢٦/ ١/ ٢٠١٣، تەق تەق (جەلال ئەحمەد لە گوندی چوخلیجە لە ساڵی ١٩ لەدایکبووە، دوو خێزانو نۆ منداڵی ئەنفال کراوە وئێستاش دانیشتوی ناحیەی تەق تەقە.
١٦- میدل ئیست ووچ: جینۆساید لە عێراقداو پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، ل ٣٢٣.
١٧- یوسف دزەی: س. پ، ل ١١٩.
١٨- یوسف دزەیی: س. پ، ل ١١٩، عەلی مەحموود: س. پ، ل١٨، منظمة حقوق الانسان: م.س، ص ٢٢٤.
١٩- چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا کاکەخان نەسرەدین لە تەق تەق، ٢٠١٣/١/٢١.
٢٠- یوسف دزەیی: س. پ، ل ١١٩، منظمة حقوق الانسان: م. س، ص ٢٢٤.
٢١- منظمة حقوق الانسان: م. س، ص ٢٢٧.
٢٢- بەشێك لە سەرۆك جاشەکان بە شێوەیەکی ناراستەخۆ هاوکاری دەربازبوونی خەڵکی ناوچەکەیان دەکردو ژمارەیەکی زۆری دانیشتووانی دەڤەرەکەیان دەرباز کرد، دیارترین ئەو سەرۆك جاشانەش سەید تاهیری جەباری. کوێخا ئەحمەدی شوان، فەتاح کتکەیی.. هتد. (چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەیوب ڕەشید خورشید لە ٢٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٣ لە گوندی قەرەناو/ ناحیەی شوان، ئەیوب ڕەشید لەدایکبووی (١٩٦٩)یەو پێشمەرگەی دێرینەو خەڵکی گوندی حاجی جەردیسی ناوچەی شوانەو ئێستا لە گوندی قەرەناو دادەنیشێ).
٢٣- عەلی مەحموود: س. پ، ل١٨- ٢٠، منظمة حقوق الانسان: م.س، ص ٢٢٤.
٢٤- ئاسۆ شوانی: گوندی جەلەمۆرو ئاغجەلەرو بۆنی ئەنفالیان لێ دێ، لە ٢٠٠٨. www. Awene . com
٢٥- ئاسۆ شوانی: لە هـ. س. پ.
٢٦- منظمة حقوق الانسان: م. س، ص ٢٣٢.

٢٧- چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا کاکەخان نەسرەدین جەلال، تەق تەق لە ٢١/١/ ٢٠١٣، چاوپێکەوتن لە گەڵ وەستا جلال ئەحمەد لە ٢٦/ ١/ ٢٠١٣.

٢٨- منظمة حقوق الانسان: م. س، ص ٢٢٩- ٢٣٠.

٢٩- چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا کاکەخان نەسرەدین، تەق تەق لە ٢٠١٣/١/٢١.

٣٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ وەستا جەلال، لە تەق تەق، ٢٦/ ١/ ٢٠١٣، چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا کاکەخان نەسرەدین، تەق تەق لە ٢٠١٣/١/٢١.

٣١- ئەو سەربازگەیەش قەڵایەکی سەربازی بوو، دەکەوتە باکوری چەمچەماڵ لە دووری (٦)کم دایە، منظمة حقوق الانسان: م. س، ص ٢٢٤، عارف قوربانی شایەتحاڵەکانی ئەنفال: ب٣، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٢٣١، چاوپێکەوتن لەگەڵ کاکەخان نەسرەدین تەق تەق لە ٢١/ ١/ ٢٠١٣، چاوپێکەوتن لەگەڵ وەستا جەلال، تەق تەق، لە ٢٦/ ١/ ٢٠١٣.

٣٢- چاوپێکەوتن لەگەڵ کاکەخان نەسرەدین، تەق تەق لە ٢١ ١/ ٢٠١٣، منظمة حقوق الانسان: م. س، ص ٢٣١.

٣٣- منظمة حقوق الانسان: ن. م. س، ص ٢٣١.

٣٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ کاکەخان نەسرەدین، تەق تەق لە ٢١ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٣، چاوپێکەوتن لەگەڵ خالیدی حاجی ئەحمەدی بۆگد، کۆیە، لە ٢٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٣، خالیدی حاجی ئەحمەد لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٩) گوندی بۆگدەو یەکێك بووە لەو کەسانەی لە پرۆسەی ئەنفال دەستگیرکراوەو دوای سێ مانگ مانەوە لە سەربازگەی تۆبزاوە ئازاد کراوە، ئێستا لە شاری کۆیە دادەنیشێ.

٣٥- چاوپێکەوتن لەگەڵ خالیدی حاجی ئەحمەدی بۆگد، لە ٢٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٣، چاوپێکەوتن لەگەڵ نەسرەدین تەق تەق لە ٢١ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٣، منظمة حقوق الانسان: م. س، ص ٢٣٢.

٣٦- منظمة حقوق الانسان: م. س، ص ٢٢٣- ٢٢٤، عارف قوربانی شایەتحاڵەکانی ئەنفال: ب٣، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٨٠، چاوپێکەوتن لەگەڵ کاکەخان نەسرەدین تەق تەق لە ٢١ ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٣، چاوپێکەوتن لەگەڵ وەستا جەلال، تەق تەق، لە ٢٦ ی کانوونی دووەمی ساڵی٢٠١٣.

٣٧- منظمة حقوق الانسان: م. س، ص ٢٣٢، عارف قوربانی شایەتحاڵەکانی ئەنفال: ب٣، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٧٩.

٣٨- عارف قوربانی: لە نوم ڕێحانەوە بۆ تۆبزاوە ئەو شۆفیر شۆفڵەی کە بەشێك لە ئەنفالکراوەکانی داپۆشی، چاپخانەو ئۆفیسێتی ئارابخا، کەرکوك ٢٠٠٤، ل٢٢.

٣٩- دەرسیم دیبەگەیی: ئینسکلۆپیدیای تاوانەکانی ئەنفال‌و کورد جینۆسایدکردنی گەلی باشووری کوردستان، هەولێر، ٢٠١١، ل ١٢٢.

٤٠- ملا شاخی: م. س، ص ٢٢٨.

٤١- ئیدریس ئۆمەرگومەتی: س. پ، ل ٧٩.

٤٢- عەلی مەحموود: س. پ، ل ١٠٧، چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕەمەزان نادر محەمەد لە شاری کەرکوك، ٢٨ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٣ (ڕەمەزان نادر لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٥)ی گوندی عەمدۆنی ناوچەی شێخ بزێنی خوارووەو یەکێکە لە پێشمەرگە دێرینەکان‌و شایتحاڵەکانی ئەنفال ئێستا لە شاری کەرکوك نیشتەجێیە).

٤٣- مارف عومەر گوڵ: پۆلێن کردنی تاوانەکانی ئەنفال بە پێی جۆرەکانی جینوساید، ل ١٣، میدل ئیست ووچ: جینوساید لە عێراقدا پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، ل ٤٧٠.

٤٤- شۆڕش حاجی رسول: م. س، ص ٢٨.

٤٥- چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕەمەزان نادر لە شاری کەرکوك، ٢٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٣، چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەیوب ڕەشید لە قەرەناو، ناحیەی شوان، ٢٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٣.

٤٦- دیارترین ئەو کەسانەش بۆ دانیشتووانی شوان‌و شێخ بزێنی کوێخا ئەحمەدی شوان بوو ئەو کاتە ڕاوێژکار (مستەشار)ی حکومەتی عێراق بوو (چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەیوب ڕەشید لە ٢٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٣.

٤٧- چاوپێکەوتن لەگەڵ ئاسۆ سوور لە گوندی قەرەناو، ناحیەی شوان، ٢٣/ ٢/ ٢٠١٣ (ئاسۆ سور ناوی ئازاد حسێن تۆفیقەو لە ساڵی (١٩٦٣) لە گوندی شەوگێر لەدایکبووە ولە ساڵی (١٩٨٢)وە بۆتە پێشمەرگەو شایەدحاڵیکی پرۆسەی ئەنفالە لە ناوچەکەدا، چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕەمەزان نادر لە شاری کەرکوك، ٢٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٣.

٤٨- چاوپێکەوتن لەگەڵ ئاسۆ سور لە گوندی قەرەناو، ناحیەی شوان، ٢٣ی شوباتی ساڵی ٢٠١٣، چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕەمەزان نادر لە شاری کەرکوك، ٢٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٣.

٤٩- چاوپێکەوتن لەگەڵ کاکەخان نەسرەدین، تەق تەق لە ٢١ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٣.

٥٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ ئاسۆ سوور لە گوندی قەرەناو، ناحیەی شوان ٢٣ی شوباتی ساڵی ٢٠١٣، چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕەمەزان نادر شاری کەرکوك لە ٢٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٣، چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەیوب ڕەشید لە ٢٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٣.

٥١- شۆڕش حاجی رسول: م. س، ص ١٠٩- ١١٠، ملا شاخی: م. س، ص ٢٢٨- ٢٢٩.

٥٢- ملا شاخی: ن. م. س، ص ٢٢٨.

*** ڕاپەڕینی چەمچەماڵ لە ڕۆژانی (١٠- ١١)ی نیسانی ساڵی (١٩٨٨)دا:-**

ئاراس عەبدولڕەحمان
لە ساڵی (١٩٨٨)دا کوردستان بەگشتی، ناوچەکانی گەرمیان بەتایبەتی کەوتبوونەبەر شاڵاوی ئەنفال و جینۆساید کردنی حکومەتی بەعس عێراقی، بە هەزاران کەسی لە ناوچەکانی گەرمیانی ئەنفال کردو گوندەکانیشی سووتاندو وێرانی کرد. حکومەتی بەعس بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتەکەی، بەڕێگای چەمچەماڵداو بە ناوبازاڕی چەمچەماڵدا دەیویست سەدان کوردی ئەنفالکراوی ناوچەی قادر کەرەم و گەرمیان کە بە زۆر سواری ئۆتۆمبیلی (باس) کرابوون بگوازێتەوە باشووری عێراق و بەزیندوویی زینده بەچاڵیان بکات، سەعات یانزەو نیوی نیوەڕۆ لە بەردەم بازاڕی (جەلال قەساب) یەکەم دەنگی نارەزایی خەڵکی چەمچەماڵ لەلایەن (قالە) شێتەوە بەرزکرایەوەو هاواری پەلاماردانی پاسەکان و ڕزگار کردنی خەڵکەکە دەستی پێکرد، بەردەم هەر دەرگای هەر پاسێك (ئینزیباتێك)ی لێ وەستابوو، دوای چەککردنی دوو ئینزیبات، بەرد باران و شکاندنی دەرگاو پەنجەرەی پاسەکان و ڕزگارکردنی ئەنفالکراوەکان بوو بە ڕاپەڕینێکی گەورەو بە دەیان کەس ڕۆڵی ڕزگارکردنی خەڵکە گیراوەکانیان بینی لەوانە: قالە شێت، ئیدریس محەمەد، مەریوان قادر، کاوەی مەلا ئەحمەد، عەلی حاجی شاکر، تاریق کەریم، سابیر مام بەکر، فاتیح کەریم، نازم بچکۆل، شێخ سەیفەدین، وەهاب ڕەزا.
ڕاپەڕین جادەو شەقامەکانی چەمچەماڵی گرتەوەو بەناچاری حکومەتی بەعس هێزێکی زۆری لەناو چەمچەماڵ بڵاوکردەوەو بە کۆپتەریش تەقەی لە خوێندکارانی قوتابخانەکانی:- (فەلەستین، برایان، ڕۆژی سەرەتایی کرد، لەوکاتەدا ژمارەیەکی زۆر لە جەماوەری ڕاپەڕیو چوونە ماڵی (فەتاح حەسەن) کە ئەوکات موستەشاری حکومەتی بەعس بوو ئەویش پشتیوانی و هاوکارییەکی باشی جەماوەری ڕاپەڕیووی کردو لە ماڵی خۆیانەوە تەقەی لە کۆپتەرەکان کردو ئەوانیش ماڵی فەتاح حەسەنیان بۆمب باران کردو کچێکی چواردە ساڵی ماڵەکە بە ناوی (فەهیمە حەسەن فەتاح) کردو شەهید بوو. دوای ئەوەی سەدان ژن و منداڵ و پیرو پەککەوتە لە دەستی سوپای بەعسی عێراق ڕزگار کران لەناو ماڵەکانی چەمچەماڵ دا شاردیاننەوە، ماوەیەکی زۆریش ڕێگای (سەنگاو- چەمچەماڵ)یان گرت، بەڵام دواتر حکومەتی بەعس بەزەبری هێز ڕاپەڕینەکەی سەرکووت کرد و دەیان گەنجی ئەو شارەی گرت و ژمارەیەك لە قوتابیانی چەمچەماڵی دەرکرد بە بیانووی بەشداریکردن لەو ڕاپەڕینەدا.

*** ڕاپەڕینی جەماوەری خوورماتوو لە ١٤ی نیسانی ساڵی ١٩٨٨:-**

دوای ئەوەی حکومەتی بەعسی عێراق دووسەنتەری تایبەت بە شوێنی دەست بە سەرکردنی ئەوانەی ئەنفال دەکران لە ناوچەی گەرمیان لە خورماتوو کردەوە:- سەنتەری یەکەم کە لە بینایەی مەرکەزی (شباب)دا بوو تایبەت بوو بەژن و منداڵ، سەنتەری دووەم بریتی بوو لەو بینایەی دواناوەندی (ڕەشید) کە تایبەت کرا بوو بە پیاوان، ئەم دوو شوێنە لەلایەن مەفرەزە تایبەتییەکانی جاش و سوپای میللی حیزبی بەعسەوە پاسەوانی دەکرا.
هەزاران پیاو ژن و منداڵ لەو دوو سەنتەرە دەست بە سەرکران و حکومەت خەریکی گواستنەویان بوو بۆ زیندانەکانی تکریت لەو کاتە دا لە ڕۆژی (١٤)ی نیسانی ساڵی (١٩٨٨) سەدان کەس لە جەماوەری شارەکە لە دژی چەکدارەکانی بەعس ڕاپەڕین و شەڕو پێکدادان لەنێوان جەماوەری ڕاپەڕیو و چەکدارەکانی حکومەتی بەعس عێراق دروست بوو، جەماوەری ڕاپەڕیو توانییان سەدان کەس لە ئەنفالکراوەکان ڕزگار بکەن و شەڕ تا ئێوارەی ئەو ڕۆژە درێژەی کێشا کە عەبدولباست عەبدولکەریم ئەحمەد گومبی بە سەختی بریندار بوو، ئێوارەی هەمان ڕۆژ چەکدارەکانی (جەبارە درێژ) کە ئەرکی پاسەوانێتی ئەنفالکراوەکانیان پێسپێردرا بوو لە هەڵوێستێکی مەردانەیاندا فەرمانەکانی سەرانی بەعسیان شکاندو نزیکەی (١٢٠٠)کەسی ئەنفالکراویان ڕزگار کرد.

* سەرچاوە:-
- ڕاپەڕینی ئاداری (١٩٩١) لە باشووری کوردستان، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی، سیاسییە، ئاراس عەبدولڕەحمان مستەفا، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، ٢٠٠٩.

*** خۆپیشاندانەکەی ساڵی (١٩٨٢)ی کەرکوك**

دیارە خۆپیشاندانی ساڵی (١٩٨٢) درێژەی زنجیرەیەك خۆپیشاندان بوو کە لە شارەکانی دیکەی کوردستان بەرپابوبوون بە تایبەتی لە قەڵادزێو پێنجوێنو سلێمانی، لە یادی بۆردومانە وەحشیگەرانەکەی ساڵی (١٩٧٤)ی قەڵادزێی خوێناویداو یەك بە یەکی شارەکانی کوردستانی گرتبووەو لە هەر شارێك کۆمەڵێك لەلاوانو گەنجانو خوێندکاران دەستگیر کرابوونو قەڵادزێی خوێناویش سەرقافڵەی راپەرینەکەو سەرقافڵەی گرتنو داپڵۆسینەکان بوون.

لە کەرکوك بەهۆی چەند هۆکارێکەوە خۆپیشاندانەکە دواکەوت کە گرینگترینیان ئەوەبوو کە لە سەرەتادا رێکخستنەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەیانویست ئەندامەکانیان لەو خۆپیشاندانە نەگلێنێ بۆ ئەوەی دووبارە و لە دوای لە دەست چوونی (کۆمیتە ئاگر) هێڵەکانی دیکەی رێکخستنی ئاشکرانەبن و نەکەونە بەرگرتن و لەناوچوون، بەڵام لە دوایدا دەرکەوت کە بەبێ رێکخستنی ناوشار مەحاڵە خۆپیشاندانو راپەرینی لەو جۆرە بەرپابکرێت، بۆیە زۆربەی رێکخستنەکانی ئەو سەردەم زۆرینەی رێکخستنەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەناو خوێندکاراندا بوو، چوونە ناو خۆپیشاندانەکەوە.

بەر لە خۆپیشاندانەکە ئەو دەنگۆیە بەشێوەیەك لەناو خوێندکارانو رێکخستنەکاندا بڵاوبووەوە کە رۆژی پێنج شەممە شەشی مایسی ساڵی (١٩٨٢) رۆژی خۆپیشاندانەکەیە. ئەوەی لەسەر چاوەکاندا بەرچاو دەکەوێت ئەوەیە کە (٨٠- ١٠٠) کەس لە رێکخستنەکانو جەماوەری کەرکوك بەشداری خۆپیشاندانەکەیان کرد. بەشێکی زۆری خەڵکەکە لە لاوانی کچو کورانی کەرکوك بوون، هەروەها خەڵکێکی زۆر لە دەرەوەی رێکخستنەکان بوون بەهۆی دڵسۆزییان بۆ کوردایەتی بەشدارییان لەو خۆپیشاندانەدا کرابوو، خەڵکی تریش لە حیزبەکانی تر هاتبوون بە تایبەتی لە حیزبی شیوعی.

خۆپیشاندانەکە لە دەوروبەری گۆڕەپانی بەرتەکییەو پشت تەکیەی تاڵەبانیو ئەم بەرو ئەو بەری شەقامە قیرتاوەکەی بەردەم تەکییەکە بوو.

بەڕێز بەختیار عەبدولڕەحمان عەبدول یەکێك لە بەشداربووانی خۆپیشاندانەکە کە دواتر گیراو ئێستا لە ئەنجامی ئەشکەنجەدان کەمئەندامە، بەم شێوەیە دەربارەی خۆپیشاندانەکە دەدوێت:- "لە پاش نیوەرۆی ٦ی ئایاری ساڵی (١٩٨٢)دا پۆل پۆل لە کورانو کچانو کاسبکاران بەرەو گۆڕستانی (شێخ محێدین) کەوتنەڕێ، پاشان خوێندکارانو قوتابیان گەیشتنە گۆڕستانی (شێخ محێدین)، کاتژمێر یەكو بیستو سێ دەقیقەی پاش نیوەڕۆ هەموو کۆمەڵەکان یەکیان گرت، خۆپیشاندانەکە بە سروودی (ئەی شەهیدان)و هوتاف کێشان دژی بەعس دەستی پێکرد، یاریکەرانی فوتبۆڵ لە گۆڕستانەکەو جەماوەرەکە تێکەڵ بە یەکتری بوون.

خۆپیشاندانەکەی نزیکەی (١٠٠) کەسی لە خۆی گرتبوو، بەرەوناو بازار کەوتنەڕێ، لە خۆپیشاندانەکەدا کۆمەڵێك کچو ژن دەبینرا، خۆپیشاندانەکە بەرەو بازاری حەسیرەکە بەرێکەوت، دروشمو هوتان کێشان بەردەوام بوو تا دەهات جۆشو خرۆشی بەدڵو دەروونی خۆپیشاندەرانەوە دەبینرا. خۆپیشاندانەکە گەیشتە نزیك خوێندنگەی (ئیمام قاسم) هەمیشە لە رابردوودا گەڕەکی ئیمام قاسم چڵێکی گەورەی چاوی دوژمنان بووە و باوەشی پڕ سۆزیان بۆ خۆپیشاندەران گرتووەتەوە.

هێرش کرایە سەر وەکیلێکی (شرکە ئەفریقی) جگە لەوەی بەعسیو پیاو خراپ بوو، دوکانەکەشی ببووە مۆڵگەی پیاو خراپان، کەلوپەلی دوکانەکەمان بەسەردا شکاند. کۆمەڵێك ئۆتۆمبیلی جاشو جاش شەعبی بەرەو رووی خۆپیشاندانەکە هاتن، بەڵام ترسانو رایان کرد، جەماوەرو خەڵکی لە ترسان دوکانیان دادەخست، بەشێکیان تێکەڵ خۆپیشاندان دەبوون.

دوژمن زانیان دۆخەکە شڵەژاوە، بە ئەمنو ئیستخباراتو دەزگاکانی بە ئۆتۆمبیلو چەکدارەوە بێ بەزییانە کەوتنە گیانی خۆپیشاندەرانو سڵیان لە کەسو هیچ نەکردەوە، بە تەقە وەڵامی جەماوەریان دایەوە، لە دەرگای قەڵاوە بە هێزێکی زۆرەوە بەرەو رووی خۆپیشاندەران بوونەوە، لە دوایش بە ئۆتۆمبیلە کانیاوە بێسلکردنەوە لە هیچ کەوتنە وێزەی خۆپیشاندەران، بەدڕندانەترین شێوە بەرەو رووی خۆپیشاندەران بوونەوە بە گوللەو شێلانی ئۆتۆمبیل کەوتنە گیانی خۆپیشاندەران. خۆپیشاندەران دوای شەهیدو بریندار بوونی ژمارەیەك بڵاوەیان کرد بە گەرەكو کۆڵانەکاندا، خۆیان شاردەوە، ئەوەی بەردەستیان بکەوتایە شەهیدیان دەکرد، بۆ نموونە هەرزەکارێك کە ئاگای لە هیچ نەبوو، بە رێکەوت کەوتە ناو خۆپیشاندەران تووشی هێزەکانی رژێم بوو، دارێکیان کێشا بەسەردا، یەکسەرگیانی سپارد، بەشێك لە خۆپیشاندەران کە لە ماڵەکاندا خۆیان شاردەوە، ماڵەکان لە ترسی گیانی خۆیانو پشکنینی هێزەکانی رژێمو شارەزایی نەبوون خۆپیشاندەرانیان تەسلیم دەکردەوە، من لە ماڵێکدا بووم تەسلیم کرامەوە دوای ئازارو ئەشکەنجەدانێکی زۆرو زیندانی، بە کەمئەندانی رزگارم بوو.

هێندە ئاگادار بم هەشت شەهیدو تا دوو سەد بریندارو گیراو هەبوو شەهیدەکان:- (فەرەیدون، ئازادە سوور، عەلی خەتاب، جەلال ئەحمەد، عەلی مەولود، عەبدولقادر حەسەن، م. عەباس، عەباس کراس سپی) بوون.

ئەو شەوە تا بەیانیو رۆژانی دوایش هەر گرتنو راوەدوونان بەردەوام بوو، گەڕەکە تەواو و کوردنشینەکانی بڵاخ، ئیمام قاسم، ئازادی، ئیسکان، حەسیرەکە تا شەقامی (جمهوری)ش ماوەیەکی زۆر لە ژێر چاودێری ووردی هێزە سەرکوتکەرەکانی رژێمدا بوون.

دروشمەکانی خۆپیشاندانەکە ئەمانە بوون:- بەهێزی مامە ریشە دووژمن دەکەین بە شیشا، بڕۆخی رژێمی فاشی بەغدا، ی. ن. ئاگرە بۆ دوژمنانی، کەم بژی کەل بژی، سەربەخۆیی بۆ کوردستان.

*** چالاكییەكانی هێزی پێشمەرگە لە دەڤەری كەركوك لە هەشتاكانی سەدەی ڕابردوو:-**

*** چالاكی قەزای كفری:-**

شەڕێكە لەناو شاری كفری كە پێشمەرگەكانی هەرێمی ٥ی قەرەداغ ئەنجامیان داوە. لە ٢١ی كانونی دووەمی ساڵی (١٩٧٨)دا پێشمەرگەكان چوونە ناو شاری كفریو زیاتر لە سێ سەعاتو نیو لەناو شار مانەوەو بەچەكی ئار پی جیو كلاشنكۆف هێرشیان كردە سەر بنكەی سەربازگیریی كفری ولە ئۆتۆمبیلێكی وازی سوپاشیان دا. لەئاكامی هەردوو چالاكیدا یەك ئەفسەرو ٢٣ سەرباز كوژران.

ڕۆژانی دواتر دەزگا ئەمنییەكانو سوپا دەستیان بە شاڵاوێكی ڕەشبگیر كردو زیاتر لە سەد هاووڵاتیی خاڵكی شاریان گرت، هەروەها لەسۆنگەی كەمتەرخەمییەوە هەموو سەربازانی بازگەی كفریو ژمارەیەك كارمەندی ئاسایشو هەواڵگریی سوپاش دەستگیر كران.

ئەمە یەكەم جار بوو لە شۆڕشی نوێدا پێشمەرگە لەناو شاری كفری چالاكی ئەنجام بدەن.

*** چالاكی سوورقاوشان**

پێكدادانێكە لەنێوان هێزی پێشمەرگەو جاشەكانی قالە فەرەج كە ڕۆژی ٢٠ی كانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧٨) لە گوندی سوورقاوشان گەمارۆی چەند پێشمەرگەیەكیان دابوو. لەم پێكدادانەدا ١٠ جاش بریندار كران لە پێشمەرگەش ڕەسوڵ ساڵح سەعید شەهید بوو.

*** چالاكی ناحیەی سەرقەڵا**

شەڕێكە لەنێوان مەفرەزەیەك لە پێشمەرگەكانی هەرێمی (٥)ی قەرەداغو پۆلیسەكانی بنكەی پۆلیسی سەرقەڵا لە شارۆچكەی سەرقەڵا لە گەرمیان لە ١٢ی كانوونی یەكەمی (١٩٧٨)، لە ئاكامدا ٦ پۆلیس كوژران.

*** چالاكی ناحیەی سەنگاو:-**

شەڕێكە لەنێوان مەفرەزەیەك لە پێشمەرگەكانی هەرێمی (٥) ی قەرەداغو هێزێكی كۆماندۆدا لەناو شارۆچكەی سەنگاو لە ١٦ ی كانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧٨). لەئاكامدا ٥ كۆماندۆ كوژران.

*** (چالاكی گوندی خاڵە بەگ):-**

چالاكییەكی گەورەی هێزی پێشمەرگەیە لە باكووری گوندی خاڵە بەگ لە ناوچەی كەلار. سەرچاوەكان لەسەر ڕۆژی چالاكییەكە یەكدەنگ نین، سەلاح ڕەنجدەر لە نامیلكەی (بازنەی ئاگر) كاتی چالاكییەكەی بە ١٤ی تەموزی ساڵی (١٩٧٩) دیاری كردووەو مەحموود سەنگاوی لە بیرەوەرییەكانیدا بە ٢٤ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٩) داناوە. لەم چالاكییەدا پێشمەرگەكانی هەرێمی ٥ی قەرەداغ سوودیان لە خراپیی كەشوهەوا وەرگرت بۆ گەیشتن بەشوێنی دیاریكراو كە لە سەرووی گوندی خاڵە بەگەوە بوو. شوێنەكە ژمارەیەكی زۆر كەمپاین كاری تێدا دەكردو هێزێكی گەورەی سوپای عێراقو جاشی لێبوو كە لەبەر سەرماو باو بۆران كەمتەرخەمییان لە كۆنترۆڵ كردنی ڕێوبانەكانو پاسەوانی كردبوو.

هێرشی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر شوێنەكە كتوپڕ بوو. ئەم كتوپڕییە ڕۆڵێكی بەرچاوی لەسەرلێشێواندنی هێزە پەلاماردراوەكەو زیاد كردنی زیانەكانی بینی. لەم چالاكییەدا (٨٠) سەربازو یەك جاش كوژران، (٨) ئۆتۆمبێل سووتێنرانو چەردەیەك تەقەمەنیش كەوتە دەستی پێشمەرگەوە. لە هێزی پێشمەرگە یەك شەهید هەبوو كە تەرمی لە شوێنی شەڕەكە بەجێماو دواتر هاووڵاتییان بە خاكیان سپارد.

*** چالاكی ناحیەی سەنگاو:-**

چالاكییەكی پێشمەرگانەیە لەناو شاری سەنگاو لە ٦ی ئایاری ساڵی (١٩٧٩). لەو چالاكییەدا پێشمەرگەیەكی كەرتی گەرمیانی سەر بە هەرێمی ٥ی قەرەداغ، نارنجۆكێكی دەستیی خستە ناو بارەگای حیزبی بەعس لەسەنگاو، لە ئەنجامدا لێپرسراوی ڕێكخراوی حیزبی بەعسو ٣ كارمەندی بارەگاكە كوژران.





* چالاکی گوندی تەپە عەرەب:-
شەڕێکە لەنێوان مەفرەزەیەکی هاوبەشی لقی ٢ی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیو کەرتی گەرمیانی هەرێمی ٧ لە لایەكو ژمارەیەك جاش لەلایەکی دیکەوە لە گوندی تەپە عەرەب لە ٢٠ی نیسانی (١٩٧٩).
لەم چالاکییەدا هێزی پێشمەرگە چووە سەر جاشەکانی قالە فەرەجو بەپێی نەخشەیەکی ورد هەموو ئامانجەکانی هێرشەکەی هێنایە دی. لە ئاکامدا ١٠ جاش کوژرانو ٦ جاشی دیکەش بریندار کران. لە هێزی پێشمەرگەش تەنها یەك پێشمەرگە بریندار بوو، ئەویش برینەکەی سووك بوو.

* چالاکی گوندی قەرەوەیس:-
چالاکییەکی پێشمەرگانەیە لەنێوان گوندی قەرەوەیسو گوندی گوڵەبان لەسەر جادەی قادر کەرەم - چەمچەماڵ لە ٣ی تەمووزی ساڵی (١٩٨٠). لەم چالاکییەدا پێشمەرگەکانی کەرتی ٤ی جەباریی سەر بە هەرێمی ٥ی قەرەداغ بۆ سەیان بۆ جاشەکانی چەمچەماڵ نایەوە.
لەسەر رێگای قادر کەرەم - چەمچەماڵ کۆمەڵێك جاش کەوتنە بۆسەکەوەو پێشمەرگەکان ئاگر بارانیان کردن، لە ئاکامدا ٥ جاش کوژرانو ١٠ جاشی دیکەش بریندار بوون. هەندێ لەو جاشانەی لەم چالاکییەدا کوژران، دەستیان لە شەهیدکردنی شاسوار جەلالدا هەبوو.

* چالاکی سوورقاوشان:-
شەڕێکە لەنێوان پێشمەگەکانی هەرێمی ٢و هێزەکانی سوپای عێراقو جاشەکان بەپاڵپشتی هەلیکۆپتەر لە گوندی سوورقاوشان لە ١٤ی تەموزی ساڵی (١٩٨٠). شەڕەکە بەسوورانەوەی چەند هەلیکۆپتەرێك بەسەر ناوچەکەدا دەستی پێکردو زۆری نەبرد چوار هەلیکۆپتەری بارهەڵگر لە قۆڵەکانی توتەمر، سرد تەلانو شێخ زێلێن ژمارەیەکی زۆر سەربازو جاشیان داگرت.
هێزی پێشمەرگەش بەسەرکردایەتیی فەرماندەی هەرێم عەلی بچکۆل بەم جۆرە دامەزران: عەلی بچکۆل لە قۆڵی تەلان، جێگیری فەرماندەی هەرێم غەریب عەسکەری لە قۆڵی بۆلقامیشو توتەمر، سەعید بێدەریو رەمەزان دووشیوانی لە قۆڵی سردو شێخ زێلێنو بێستون عەسکەری لە قۆڵی گوندی شێخان. شەڕ تا ئێوارە درێژەی کێشا، هێزەکانی دوژمن لە هەموو قۆڵەکانی شکانو زیانێکی زۆریان لێکەوت. لەم شەڕەدا (١٠) هەلیکۆپتەری جەنگی بۆردومانی سەنگەرەکانی پێشمەرگەی دەکرد، لەوانە (٣)دانەیان پێکرانو لە شارۆچکەی ئاغجەرلەر نیشتنەوە.
هێزی پێشمەرگە حەوت برینداری هەبوو کەزۆربەیان برینەکەیان سووك بوو. لەوانە پێنجیان بەهۆی بۆردومانی هەلیکۆپتەرە جەنگییەکانەوە بریندار بوو بوون.
ژمارەی پێشمەرگە لەم شەڕەدا (٤٠) پێشمەرگە بوو چەکەکانیشیان بریتی بوو لە کلاشنکۆف، برنەو، ئار بی جی، ژێ سێو رەشاشی دیکتاریۆف، ئەم شەڕە یەکێ لە شەڕە گرنگەکانی پێش هەڵایسانی شەڕی عێراق - ئێرانە.

* چالاکی گوندی مام رەش:-
شەڕێکە لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزێکی گەورەی جاشەکان لە ٦ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨٠) لە گوندی مام رەش. رۆژێك پێش شەڕەکە، پێشمەرگەکانی کەرتی ٣ی هەرێمی ٢ی کەرکوك بەفەرماندەیی حەمید کەریم کەرکوکی (پشتیوان) کۆبوونەوەیان بە دانیشتوانی گوندی چیمەنی گەورە کردبوو. هەر ئەو ئێوارەیە، دوای تەواوبوونی کۆبوونەوەکە، چوو بوون بۆ گوندی مام رەشو شەو لەوێ مابوونەوە.
جاشەکان زانیبویان مام رەش پێشمەرگەی لێیە، بۆیە بەیانییەکەی زوو بەهێزێکی زۆرەوە گەمارۆی گوندەکەیان داو هێرشیان کردە سەر هێزی پێشمەرگە. شەڕ تا ئێوارەی ئەو رۆژە درێژەی کێشا. لەو کاتەدا هەواڵی گەمارۆدانی پێشمەرگە گەیشتە کەرکوك، لەوێ رێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان خێرا گەیاندە کەرتی ١ی هەرێمی ٢ی کەرکوك لە گوندی عەسکەرو دوا بەدوای ئەمە، پێشمەرگەکانی کەرتەکە چوون بەهانای پێشمەرگە گەمارۆدراوەکانەوەو ئابلۆقەکەیان شکاند. ئەم شەڕە یەکەم شەڕی ناو گوند بوو کە هێزی پێشمەرگە ئەنجامی داوە.
لەم شەڕەدا هێزی پێشمەرگە ٥ شەهیدی هەبوو کە بریتین لە حەمید کەریم کەرکوکی (پشتیوان) فەرماندەی کەرتی ٣ی هەرێمی ٢ی کەرکوك، تاهیر بابە قەمەری (کادر)، مەلا ئەحمەد عەودل مام رەشی، مەناف تالیب چالاوی (شاخەوان)و بیلال جەلال چالاوی، لەوانە دووانیان بەبرینداری کەوتنە بەر دەستی جاشەکان، یەکێکیان هەر لەوێ شەهید کراو ئەوی تر برایە چەمچەماڵو لەوێ شەهید کرا. پێشمەرگەکانی تر کە بەشدار بوون لەم شەڕەدا بریتی بوون لە سالار بۆگدی، شێرکۆ عەسکەری، مەلا وەیسی عەودل، شێرزاد عەبدولحافز، سالح سەیدانی، عەبدوڵڵا سوور بۆ گدی، فەرهادە سوور، ئامیق شوکر (پێشرەو)، شۆڕش قەرەهەنجیری، محەمەد عەلی ئەحمەد (ئامانج)، سیروان عەلیو عەلە رەش تەپەکوری.

* چالاکی گوندی شۆراوە:-
شەڕێکە لەنێوان پۆلێك پێشمەرگەی کەرتی ٤ی جەباری بەفەرماندەیی بێستون بارۆییو هێزێکی زۆری جاشو سەرباز بەپاڵپشتی هەلیکۆپتەری جەنگی، لە ١٧ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٠) لەچیای شۆراوەی ناوچەی هەمەوند. شەڕەکە لەبەرەبەیانەوە تا ئێوارە درێژەی کێشاو تێیدا هەلیکۆپتەرەکان چەند جارێك تەقەمەنییان تەواو دەبوو، خێرا دەگەرانەوە بۆ چەمچەماڵو بەتەقەمەنییەوە دەهاتنەوە مەیدانی شەڕ.
لەسەرەتادا پێشمەرگەکان جاشەکانیان گەمارۆ دابوو و خەریك بوو هەموویان لەناو بەرن، بەڵام هێزێکی زۆری سوپا بەپشتیوانیی هەلیکۆپتەر فریای جاشەکان کەوت. لە ٤٤ پێشمەرگە ١٥ پێشمەرگە شەهید بوون، پێشمەرگەیەکیش بەبرینداری بەدیل گیراو دواتر لەسێدارە درا. شەهیدەکان ئەمانەن: نەجمەددین عوسمان قادر کەرکوکی، ئەوزاد محەمەد ئەمین حوسێن، فاتیح حەمە سەعید سەنگاوی،

بێستون باڕۆیی، حوسێن عەبدوڵڵا، محەمەد دڵکەیی، عەدنان عەلی محەمەد، شەریف سابیر کونە کۆتری، نورەددین رەشید (نوری سالەیی)، رەمەزان مستەفا کانی مستەفایی، جەبار فایەق مەجید پونگەلەیی، قادر حوسێن ئەحمەد شاحەسەنی، نوری محەمەد عەلی (مەلا نوری)، جەوهەر حوسێن ئەحمەد هەشەزینی، عەلادین عەبدولکەریم محەمەد، عومەر باینجانی، ئەرکان ئەمین قادر چراغە رووتەیی.

*** ژیاننامەی بەشێك لە شەهیدەکانی شەرەکە :-**

– ئەرکان ئەمین قادر:

ناسراو بە ئەرکان چراغە رووتەیی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٢)ی گوندی چراغە رووتە. ساڵی (١٩٧٩) پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە کردووە. لەژیانی پێشمەرگایەتیدا لە سنووری هەرێمی ٥ی قەرەداغ، لە ناوچەی سەنگاوو جەباریو قادر کەرەمو قەرەداغ، بەشداریی چەندین شەڕو نەبەردی کردووە.

– نەجمەددین عوسمان قادر:

ناسراو بە نەجمەددین کەرکوکی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٦)ی گوندی وەسمان لە دەوروبەری کەرکوك. ساڵی (١٩٧٧) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو هەر ئەو ساڵە بە گومانی پەیوەندی کردنی بە کۆمەڵەوە لەلایەن دەزگای ئەمنی کەرکوکەوە دەستگیر کراوە. بەڵام هیچی لەسەر ئاشکرا نەبووە، خۆیشی هیچی ئاشکرا نەکردووە.

ساڵی (١٩٨٠) پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو لە کەرتی ٤ی جەباری سەر بەهەرێمی ٥ی قەرەداغ هەڵسووڕانی پێشمەرگانەی دەستپێکرد.

– فاتیح حەمە سەعید سەنگاوی:

ناسراو بە فاتیح سەنگاوی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٣)ی گوندی هەشەزینی لە ناوچەی سەنگاو. خوێندنی سەرەتایی لەو گوندە تەواو کردووە. ساڵی (١٩٧٧) پەیوەندیی بە رێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کردو بۆ ساڵی دواتر بووە پێشمەرگە لەکەرتی ٤ی جەباری سەر بەهەرێمی ٥ی قەرەداغ. ساڵی (١٩٧٩) کرایە فەرماندەی مەفرەزە.

– عومەر باینجانی:

لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٥)ی گوندی پێباز لە ناوچەی گەرمیان، ساڵی (١٩٧٧) پەیوەندەیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردو دواتر بوو بە پێشمەرگە لە کەرتی ٤ی جەباری سەر بە هەرێمی ٥ی قەرەداغ.

لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی بەشێکی زۆری شەڕو نەبەردەکانی سنووری کەرتەکەی کردووە.

– عەدنان عەلی محەمەد:

ناسراو بە عەدنان کەرکوکی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٥)ی گەرەکی شۆڕیجەی شاری کەرکوك. تا پۆلی سێی ناوەندیی خوێندووە. ساڵی (١٩٧٩) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو ولە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٠)دا بووەتە پێشمەرگە لە کەرتی ٤ی جەباری سەر بە هەرێمی ٥ی قەرەداغ.

پاش ١٦ رۆژ لە بوونی بە پێشمەرگە، لە ١٧ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٠)دا لە چیای شۆڕاوەی ناوچەی هەمەوەند کەرتەکەی تووشی شەڕێکی دەستەویەخە بوو لەگەڵ هێزێکی بەربڵاوی سەرباز و جاش کە هەلیکۆپتەریش پشتگیریی دەکرد. لەو شەرەدا پاش بەرگرییەکی درێژخایەن دەیان پارچەی تەقەمەنیی بەرکەوتو دەستێکیشی لە شەرەکەدا قرتا. پێشمەرگەکانی ٥ی قەرەداغ لە کاتی کشانەوەیاندا بەجێیان نەهێشت وتوانیان لەگەڵ خۆیاندا ببەن بۆ گوندی هەنجیرە و لەوێوە گەیاندیانە گوندی باڵا جۆو لەوێشەوە بە تراکتۆر بردیانە گوندی هەڵەی سەروچاوەو لەوێوە بۆ دێلێژە بۆ ئەوەی فریای چارەسەرکردنی بخەن، بەڵام رۆژێك پاش شەرەکە، لە ١٨ی تشرینی دووەمدا شەهید بووو لە گوندی دێلێژە نێژرا.

– قادر حوسێن مستەفا:

ناسراو بە قادر شاحەسەنی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٣) ی گوندی شاحەسەن. ساڵی (١٩٧٧) پەیوەندیی بە رێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کردووە، چەند جارێك لەلایەن دەزگای ئەمنەوە بە گومانی پەیوەندەیی بە یەکێتییەوە گیراوە، بەڵام هیچ جارێك هیچی نەدرکاندووەو توانیویەتی خۆی دەرباز بکات.

ساڵی (١٩٧٩) پاش هەڵکشانی هەرەشە بۆ سەر ژیانی، پەیوەندەیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو لە کەرتی ٤ی جەباری سەر بە هەرێمی ٥ی قەرەداغ بووەتە پێشمەرگە.

– رەمەزان مستەفا کانی مستەفایی:

لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٤)ی گوندی کانی مستەفا لە ناوچەی چەمچەماڵ. ساڵی (١٩٧٦) چووە ریزی رێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە ولە ٢٥ی ئەیلولی ساڵی (١٩٧٩)دا پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە کرد ولە کەرتی ٤ی جەباریی سەر بە هەرێمی ٥ی قەرەداغ ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکرد.

– شەریف سابیر کونە کۆتری:

لەدایکبووی ساڵی (١٩٤٨)ی گوندی کونە کۆتر. ساڵی (١٩٧٦) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کردووەو لەساڵی (١٩٧٨) بووەتە پێشمەرگە لە کەرتی ٤ی جەباری سەر بە هەرێمی ٥ی قەرەداغ.

– جەبار فایەق مەجید:

ناسراو بە جەبار پونگەلەیی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٣)ی گوندی پونگەلە. ساڵی (١٩٧٩) بووەتە پێشمەرگە لە کەرتی ٤ی جەباریی سەر بەرهەرێمی ٥ی قەردەاغ. بەشداریی لە ژمارەیەکی زۆر شەڕو نەبەردی سنووری هەرێمەکەی کردووە.

– حوسێن عەبدوڵڵا محەمەد ساڵح:

ناسراو بە حوسێن دڵکەیی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦١)ی گوندی دڵکە لە ناوچەی سەنگاو. ساڵی (١٩٧٨) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە. ساڵی (١٩٧٩) لەسەر جادەدەی سەنگاو – چەمچەماڵ سەربازێکی سوپای عێراقی چەك کردو بەدیلی بردی بۆ ناو

پێشمەرگەو خۆیشی بوو بە پێشمەرگە لە مەفرەزەیەکەی سەر بەکەرتی ٤ی جەباریی سەر بە هەرێمی ٥ی قەرەداغ. لە ماوەی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی چەندین شەڕو نەبەردو پێکدادانی لە دژی سوپای عێراقکردووە.

- نورەددین ڕەشید ناسر:

ناسراو بە نوری سالەیی. لەدایکبووی سالی (١٩٥٧) ی گەڕەکی شۆڕیجەی شاری کەرکوك. سالی (١٩٧٩)



پەیوەندەیی بەریزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردو هەر ئەو ساڵە بووە پێشمەرگە لە کەرتی ٤ی جەباری سەر بە هەرێمی ٥ی قەرەداغ.

- جەوهەر حوسێن ئەحمەد هەشەزینی:

لەدایکبووی سالی (١٩٥٥)ی گوندی هەشەزینی ناوچەی سەنگاو. سالی (١٩٧٨) پەیوەندەیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو سالی پاشتر بووەتە پێشمەرگەی کەرتی ٤ی جەباریی هەرێمی ٥ی قەرەداغ. لەشەڕی شۆڕاوەدا بەبریندراری کەوتە دەست جاشەکان و دواتر ڕادەستی سوپای عێراق کرا. لە ٩ی ئایاری سالی (١٩٨١) لە بەندیخانەی موسل لە سێدارە درا.

*** چالاکی هەنارە:-**

شەڕێکە لە ٢٥ی ئایاری سالی (١٩٨٥) لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزێکی سەربازو جاش کە بە پالپشتی سێ زرێپۆش و ١٥ هەلیکۆپتەر هێرشیان بردبوە سەر بنکەکانی هێزی پێشمەرگە لە گوندی هەنارە لە ناوچەی گەرمیان. سەعات ٤ی بەرەبەیانی ئەو ڕۆژە. هێزەکەی دوژمن هێرشی دەست پێکرد. هێزەکانی تیپی ٥١ی گەرمیان و ٥٣ی شێروانەو تیپی مەلبەندی یەك بەرپەرچی هێرشەکەی دوژمنیان دایەوە. شەر تا سەعات ١٥ درێژەی کێشا بەبێ ئەوەی دوژمن من بتوانێ دەست بەسەر گوندەکەدا بگرێ. زیانی دوژمن کوژرانی ٤ سەربازو بریندرابوونی ٤ی دیکە بوو. لاشەی کوژراوەکان لە مەیدانی شەر بەجێما. هێزی پێشمەرگە دەستی بەسەر ٤ کلاشنکۆف و دوو سندوقی فیشەك و هەندێ کەلوپەلدا گرت.

هەر لەم شەڕەدا دوو هەلیکۆپتەر پێکران کە دواتر یەکێکیان لە قادر کەرەم کەوت و ئەوی تر لە سەنگاو.

*** چالاکی گوندی سوورقاوشان:-**

شەڕێکە لەنێوان پێشمەرگەکانی هەرێمی ٢و هێزەکانی سوپای عێراق و جاشەکان بەپالپشتی هەلیکۆپتەر لە گوندی سوورقاوشان لە ١٤ی تەموزی سالی (١٩٨٠). شەڕەکە بەسوورانەوەی چەند هەلیکۆپتەرێك بەسەر ناوچەکەدا دەستی پێکردو زۆری نەبرد چوار هەلیکۆپتەری بارهەلگر لە قۆڵەکانی تەتەمر، سرد تەلان و شێخ زێلێن ژمارەیەکی زۆر سەربازو جاشیان دا گرت. هێزی پێشمەرگەش بەسەرکردایەتیی فەرماندەی هەرێم عەلی بچکۆل بەم جۆرە دامەزران: عەلی بچکۆل لە قۆڵی تەلان، جێگیری فەرماندەی هەرێم غەریب عەسکەری لە قۆڵ بۆلقامیش و توتەمر، سەعید بێدەری و ڕەمەزان دو شیوانی لە قولی سردو شێخ زێلێن و بیستون عەسکەری لە قۆلی گوندی شێخان.

شەر تا ئێوارە درێژەی کێشا، هێزەکانی دوژمن لە هەموو قۆڵەکانی شکان و زیانێکی زۆریان لێکەوت. لەم شەڕەدا ١٠ هەلیکۆپتەری جەنگی بۆردومانی سەنگەورەکانی پێشمەرگەی دەکرد، لەوانە ٣ دانەیان پێکران و لە شارۆچکەی ئاغجەرلەر نیشتنەوە.

هێزی پێشمەرگە حەوت بریندراری هەبوو کە زۆربەیان برینەکەیان سووك بوو. لەوانە پێنجیان بەهۆی بۆردومانی هەلکۆپتەرە جەنگییەکانەوە بریندار بوو بوون.

ژمارەی پێشمەرگە لەم شەڕەدا ٤٠ پێشمەرگە بوو چەکەکانیشیان بریتی بوو لە کلاشنکۆف، برنەو، ئار پی جی، ژێ سێ و ڕەشاشی دیکتاریۆف. ئەم شەڕە یەکێ لە شەرە گرنگەکانی پێش هەلایسانی شەڕی عێراق- ئێرانە.

*** ئۆپەراسیۆنی لەیلان:-**

ئۆپەراسیۆنی گرتنی پێنج کارمەندی ئەڵمان لە پارێزگای کەرکوك لە مانگی حوزەیرانی (١٩٨١). لەو پێنج کارمەندە، چواریان لە گوندی لەیلان گیران و ئەوی تر لەنێوان کەرکوك و چەمچەماڵ. ئەوەی کە ئەم ئۆپەراسیۆنەی ئەنجام داوە پێشمەرگەکانی کەرتی ٤ی جەباریی هەرێمی ٥ی قەرەداغ بوون.

بەیاننامەیەك کە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەم بارەیەوە دەری کردووە، ڕوونی دەکاتەوە کە یەکێتی لە سیاسەتی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا نیگەران بووە، هۆی نیگەرانییەکەش زۆرتر پەیوەندیی بە سێ فاکتەرەوە هەبووە:

یەکەم: پەیوەندیی ئابووریی توندوتیژیی نێوان عێراق و ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کە مایەی هەڕەشە بوو بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی گەلی کورد.

دووەم: ئازادکردنی دوو سیخوڕ عێراقیی سەر بە دەزگای هەواڵگریی ڕژێمی بەعس لەلایەن حکومەتی ئەڵمانیای ڕۆژئاواوە لە سالی (١٩٨٠)، لە کاتێکدا کە بەلگەی تەواو لەسەر هەوڵی هەردوو سیخوڕ بۆ تەقاندنەوەی ئەو بینایە هەبوو کە کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد کۆنگرەی تێدا دەبەست.

سێیەم: فرۆشتنی چەك و تەقەمەنی ئەڵمانی بە عێراق.

کارمەندە گیراوەکان ئەمانە بوون: برنیت ویهلە (تویورلوپە)،

ئەدمۆند دیتریش (بودینگ)، کریستۆ کالم باج (کارلزروهی)، فریتسنگ بۆلتەر (شتوتگارت) و ئەنیت کارل (ئەنسین هرف). یەکێتی بۆ ئازاد کردنی کارمەندە ئەڵمانەکان ئەم داوایانەی لەبەردەم حکومەتی ئەڵمانیای رۆژئاوا دانا:

١- دەبێ حکومەتی ئەڵمانیای خۆرئاوا بەشێوەیەکی فەرمی داوای لێبوردن بکا. چوونکە دوو سیخوڕی عێراقی ئازاد کردووەو بەپێی یاسا مامەڵەی لەگەڵ نەکردوون.

٢- دەبێ بەڵێن بدا کە چیتر چەك و تەقەمەنی بەعێراق نافرۆشێ.

٣- گوشار بخاتە سەر حکومەتی عێراق بۆ ئازادکردنی ٢٧ هاووڵاتیی کورد کە فەرمانی لەسێدارەدانیان بۆ دەرچووەو لە گرتوخانەی موسڵن.

٤- گوشار بخاتە سەر حکومەتی عێراق بۆ بەردانی ٤ منداڵی کوردی خەڵکی شاری کەلار کە تەمەنیان لە خوار ١٣ ساڵەوەیەو لە مانگی شوباتی (١٩٨٢)ەوە گیراون.

٥- گوشار بخاتە سەر حکومەتی عێراق بۆ بەردانی کەسووکاری گیراوی پێشمەرگەکان.

٦- پێشکەش کردنی پێنج ملیۆن مارك بەکەسووکاری شەهیدان و کەسووکاری گیراوی پێشمەرگە.

بەیاننامەکە ناوی منداڵە گیراوەکان و حوکمدراوەکانی گرتوخانەی موسڵی هاوپێچ کردبوو، ئەویش بە مجۆرە:

منداڵە گیراوەکان: نەسرین ئەکرەم (١٢ ساڵ)، بورهان محەمەد قادر (١٢ ساڵ)، عوسمان عەزیز رۆستەم (١٢ساڵ)، فوئاد محەمەد ئەمین (١٢ ساڵ).

هاووڵاتییە حوکمدراوەکان: جەمال قادر، جەلال محەمەد، عەبدوڵڵا رەسوڵ، عومەر میرزا، بەرزان عومەر، جەوهەر حوسێن، سەید برایم ئەحمەد، ئیسکەندەر حەیدەر، عەلی تۆفیق، دارا حەمید، عەلی محەمەد، بێستون حوسێن، عەلی حەمە ئەمین، مەحمود محەمەد، یوسف مەجید، بەکر کەریم، تەحوسێن رەحمان، جەمیل ئەحمەد، جەوهەر حەمە، شێرۆ رەشید، یونس بابەکر، حەسەن ئیسماعیل، واحد رەسوڵ، سلێمان عەبدوڵڵا، تاهیر عەبدوڵڵا، ئومێد ساڵح کەریم، مەجید عیسا.

کارمەندە ئەڵمانەکان ماوەیەك لە ناوزەنگ لە بارەگای دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە مانەوەو پاشان ئازاد کران و لەرێی ئێرانەوە گەرانەوە بۆ ئەڵمانیا. هیچ یەکێ لە داواکان جێبەجێ نەکران، بەڵام گرتنی کارمەندە ئەڵمانەکان لە میدیاکانی ئەڵمانیا زۆر دەنگی دایەوەو سەرنجی بەلای مەسەلەی کوردی عێراقدا راکێشا.

*** چالاکی گوندی حەساری وەلی پاشایی:-**

شەرێکە لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزەکانی سوپای عێراق لە گوندی حەساری وەلی پاشا لە نزیك کەرکوك لە ٩ی ئازاری ساڵی (١٩٨١). لەم شەرەدا پێشمەگەکانی کەرتی ١ی هەرێمی ٢ لە هێزێکی سوپایاندا، دوو زیلیان تێکشکاند، پێنج سەربازییان کوشت و ژمارەیەکی تریشیان بریندار کرد. هێزێکی تری سوپا بەهانای هێزە گیرخواردووەکە هات، پێشمەرگەکان لەوێش هاتنە دەست و گوللەبارانیان کرد.



چەند پێشمەرگەیەکی کەرکوک

هێزی پێشمەرگە بێ زیان بوو.

*** شەری گوندی قازان:-**

شەرێکە لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزێکی گەورەی سوپای عێراق لە گوندی قازانی نزیك تاسلوجەی شاری سلێمانی لە ساڵی (١٩٨٢)دا کە تێیدا یانزە پێشمەرگە شەهید بوون، لەوانە ئەنوەر حەسەن فەرماندەی هەرێمی ٢ی کەرکوك. لە ٥ی ئازاری (١٩٨٢) دوو مەفەرەزەی هەرێمی ٢ی کەرکوك، کە یەکێکیان مەفرەزەی تایبەتی فەرماندەی هەرێم بووو ئەوی تر مەفرەزەیەکی کەرتی ٢ی هەرێمەکە بوو، بەفەرماندەیی ئەنوەر حەسەن، کە سەرجەمی ژمارەی پێشمەرگەکانیان ٢٢ پێشمەرگە بوو، رووبەرووی هێزێکی گەورەی سوپای عێراق وجاشەکان بوونەوە کە پاڵپشتی هەلیکۆپتەری جەنگی هێرشێکی بەربڵاوی کردبووە سەر هێزەکە.

شەرەکە ١١ سەعاتی خایاند، لە سەعات ٩وە تا سەعات ٢٠ درێژەی کێشا، تێیدا پەلاماردەرەکان زیاد لە ٣٠ کەسیان لێ کوژراوو ژمارەیەکی زۆریان لێ بریندار بوو. لە هێزی پێشمەرگە ١١ شەهید هەبوو، لەسەروی هەموویانەوە فەرماندەی هەرێمی ٢ی کەرکوك ئەنوەر حەسەن. شەهیدەکانی تر بریتین لە:- رزگار جەلال قەساب، نوعمان عەبدوڵڵا عوبێد، نەجمەددین فاتیح شوکر، حەمە ساڵح سدیق، حەمە شوکر عەلی ئەحمەد، جومعە حەسەن کەریم سلێمان، کامەران عومەر حوسێن، کەمال قادر فەتاح، عەبدولخالق ساڵح ئەحمەد، عەبدولخالق ساڵح قادر.

مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەبۆنەی شەهیدبوونی ئەم پۆلە پێشمەرگەیەوە، بەیاننامەیەکی دەرکردو تێیدا وردەکاریی رووداوەکەی خستە بەرچاو. بەڵام لیستی ناوی شەهیدەکان لە بەیاننامەکەدا هەڵەو کەموکوریی تێدا بوو. لە بەیاننامەکەدا باس لە ١٢ شەهید کراوە، لەکاتێکدا شەرەکە ١١ شەهیدی لێکەوتووەتەوە. ئەم هەڵەیە هەڵەیەکی تری بەدواوە هات، ئەویش ئەوەیە کەرادیۆی دەنگی گەلی کوردستان لە کاتی روماڵ کردنی هەواڵەکەدا، بەپێودانگی (دوانزە سوارەی مەریوان) کە چیرۆکێکی فۆلکلۆریی باوی کوردەوارییە، نازناوی (دوانزە

سوارەی قازان)ی بۆ شەهیدەکان بەکارهێنا.
لەو ١٢ ناوەی کە بەیاننامەکە بەشەهید ناوی بردوون، دوانیان شەهید نین و بەهەڵە ناویان کەوتووەتە لیستەکەوە. یەکێکیان سیروان کوێخا نەجمەو ئەوی تر موەفەق تەقییە کە هەردووکیان پێشمەرگەی هەرێمی ٢ی کەرکوك بوون، بەڵام لەکاتی شەڕەکەدا لەگەڵ هێزەکەدا نەبوون. ناوی شەهیدێکیش لەبەیاننامەکەدا نەهاتووە، ئەویش جومعە حەسەن کەریم سلێمان ناسراو بەسیروانە. هەندێ ناویش بەکەموکورییەوە لە بەیاننامەکەدا هاتووە، ئەویش بەمجۆرەیە:- عەبدوڵڵا ساڵح راستییەکەی (عەبدولخالق ساڵح قادر)ە، سوارە شێخ سدیق راستییەکەی (حەمە ساڵح سدیق)ە، کەریم چەمچەماڵی راستییەکەی (کەمال قادر فەتاح)ە، نوعمان عەبدی راستییەکەی (نوعمان عەبدوڵڵا عوبێد)ە. لە لیستەکەدا پێنج ناو بەبێ هەڵە هاتوون کە بریتین لەناوەکانی هەر یەك لە رزگار جەلال و عەبدولخالق ساڵح ئەحمەدو کامەران عومەر حوسێن و حەمە شوکر عەلی ئەحمەدو نەجمەددین فاتیح شوکر.
بەشێکی هۆی هەڵەکان بۆ لێکچوونی ناوەکان و تێکەڵ کردنی ناوی راستەقینەو ناوی نهێنی دەگەڕێتەوە، بەتایبەتی کە هێزی پێشمەرگە تا ئەو کاتە هیچ تۆمارێکی تایبەت بەناوی پێشمەرگەی نەبووە.

*** پاشکۆی ژیاننامەی شەهیدەکانی شەڕی قازان**
- ئەنوەر حەسەن: فەرماندەی هەرێمی ٢ی کەرکوك.
- رزگار جەلال قەساب:
ناسراو بە هێمن. لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٧)ی چەمچەماڵ. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە چەمچەماڵ تەواو کردووەو بۆ خوێندنی دواناوەندی، لە ساڵی (١٩٧٤) چۆتە سلێمانی و لەوێ ئامادەیی پیشەسازیی تەواو کردووە.
ساڵی (١٩٧٦) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو لەو ماوەیەدا چالاکانە ئەرکەکانی سەر شانی لەناو رێکخستن جێبەجێ کردووە.
ساڵی (١٩٧٩) پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردووەو لە هەرێمی ٢ی کەرکوك بووەتە پێشمەرگە. لە ماوەی پێشمەرگایەتیدا کادرێکی سیاسیی لێهاتوو بووە.
- نوعمان عەبدوڵڵا عوبێد:
ناسراو بە نوعمان کلاوقوتی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٤)ی گوندی کلاوقوت لە ناوچەی شوان. ساڵی (١٩٧٧) لە کەرکوك پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە. لەو ماوەیەدا لە هەڵسووڕاوە کاراکانی کۆمیتەی ئاگر بووەو چەندین چالاکی و کاری شۆڕشگێڕانەی لەناو کەرکوك ئەنجام داوە.
ساڵی (١٩٨١) پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردو لە هەرێمی ٢ی کەرکوك بووە بە پێشمەرگە. سەرەڕای تەمەنی کورتی لە پێشمەرگایەتیدا. بەشدار بووە لەزۆربەی چالاکییەکانی سنووری هەرێمەرکەی.
- نەجمەددین فاتیح شوکر:
ناسراو بەشیروان. لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٦)ی شاری کەرکوك. بەر لەوەی پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە بکا، لەگەڵ چەند هاورێیەکی بەشدار بوو لە دامەزراندنی رێکخراوێکی چەپی مارکسیست بەناوی (رێکخراوی تێکۆشانی کارگەران). دوای زیادبوونی مەترسی لەسەر گیانی، بڕیاریدا کەرکوك بەجێبهێڵێ و پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە بکا. لەساڵی (١٩٨٠)دا بووە پێشمەرگەی هەرێمی ٢ی کەرکوك.
- حەمە ساڵح سدیق:
ناسراو بەسوارە. لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٥)ی گوندی کۆزبۆرەی ناوچەی ئاغجەلەر. ساڵی (١٩٧٦) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو ساڵی (١٩٧٩) بووەتە پێشمەرگەی هەرێمی ٢ی کەرکوك.
- کامەران عومەر حوسێن:
ناسراو بە کامەران مام عومەر نەجار. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦١)ی شاری کەرکوك. لەشار لەناو رێکخستنە نهێنییەکاندا کاری کردووە. ساڵی (١٩٨١) پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردووەو لە هەرێمی ٢ی کەرکوك ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکردووە.
سەرەڕای کورتیی ماوەی پێشمەرگایەتیی بەشدار بووە لە زۆربەی نەبەردی و چالاکییەکانی سنووری هەرێمەکەی.
- حەمە شوکر عەلی ئەحمەد:
ناسراو بە حەمە شوکر بلوکێنی. لەدایکبووی گوندی بلوکێنی ناوچەی ئاغجەلەر. ساڵی (١٩٧٧) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو ساڵی (١٩٧٨) بووەتە پێشمەرگە لە هەرێمی ٢ی کەرکوك.
- جومعە حەسەن کەریم سلێمان:
ناسراو بەسیروان. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٢)ی شاری کەرکوك. ساڵی (١٩٨١) لە هەرێمی ٢ی کەرکوك بووەتە پێشمەرگە.
- کەمال قادر فەتاح:
ناسراو بە گۆران. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٢)ی چەمچەماڵ. ساڵی (١٩٧٩) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو لەساڵی (١٩٨١) دا بووەتە پێشمەرگەی هەرێمی ٢ی کەرکوك.
- عەبدولخالق ساڵح قادر:
ناسراو بە چیا. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٢). ساڵی (١٩٨٠) بووەتە پێشمەرگەی هەرێمی ٢ی کەرکوك.
- عەبدولخالق ساڵح ئەحمەد:
ناسراو بە ئاسۆ. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٢)ی شاری کەرکوك. ساڵی (١٩٧٧) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو رۆڵێکی بەرچاوی لە کۆمیتەی ئاگردا نواندووە. لە رووی ئاستی خوێندنەوە، دەرچوی پەیمانگای مامۆستایانی هەولێر بووە.
ساڵی (١٩٨١) پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردووەو لە هەرێمی ٢ی کەرکوك بووەتە پێشمەرگە. سەرەڕای کورتیی ماوەی پێشمەرگایەتیی، بەشدار بووە لە بەشێکی زۆری

نەبەردو چالاکییەکانی سنوورەکەی و لەم رووەوە کارامەییەکی زۆری نواندووە، بەجۆرێك کە کراوەتە فەرماندەی کەرت.

*** پاشکۆی بەیاننامەی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان**

**هەڤاڵانی تێکۆشەر**

**هاونیشتمانییە خۆشەویستەکان**

بەداخ و پەژارەیەکی زۆرەوە، مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان شەهید بوونی رۆڵەی دڵسۆزو بەوەفای گەلەکەمان و هەڤاڵی هێژاوو ئازاو پێشمەرگەی ژیرو نەبەز کاك ئەنوەر حەسەن و یانزە قارەمانی ترتان پێ ڕادەگەیەنێت. ئەو دوانزە قارمانە ئەمرەی داستانی دوانزە سوارەی کوردستانیان بە خوێنی گەشیان تۆمار کردووە، سەروەییەکانی مێژووی کوردایەتی و شۆڕشیان دەوڵەمەندتر کردووەو لاپەرەیەکی تری پڕ لە شانازی و فیداکاری و لە خۆبوردنیان لە مێژووی کوردەواری دا سوور کردووەو قوربانیی ئەم نەورۆزەی ئەمساڵەمانن، کە:

ئاگرێکی وەهای خستە جەرگەوە

لاوان بە عەشق ئەچوون بەبەرەو پیری مەرگەوە.

* داستانی ئەم قارەمانەتییەش ئەمەیە کە

لە خوارەوە بۆ تان دەگێڕینەوە

هەڤاڵانی خۆشەویست

هاونیشتمانانی بەرێز

لە ماوەی ئەم چەند مانگەی دواییدا، کە شەڕی ناوخۆ تا ڕادەیەك دامرکاوەتەوەو هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان هەر یەکەیان چووەتەوە شوێنی دیاریکراوی چالاکی و جموجولی خۆی و لە باتی خەریك کردنی بە شەڕی لاوەکییەوە، خەریکی ئەنجام دانی کارو فرمانی سەرەکیی خۆیەتی لە بەگژا چوونی ڕژێم و دانانی نەخشەو پلانی لێدانی هێزە داگیرکەرەکانی ڕژێمی فاشیستی عێراقدا لەم ماوەیەدا، ئەگەرچی سەرماو بەفرو زریانی کەم وێنەی زستانی ئەمساڵ لە زۆر شوێن بوو بە هۆی کەمکردنەوەی هاتوچۆو جولانەوەو تەنانەت مردن و رەق بوونەوەی چەندین هاووڵاتی و چەندین پێشمەرگەش، لەگەڵ ئەوەشدا، لەو چەند مانگە کەمەدا، سەرەڕای نالەباریی باری هەوا، لە چەندین شوێن... دەستی قارەمانانە لە دوژمن وەشێنراوەو چەندین هەڵمەت و بۆسەو شاڵاوو بەرگریی دلێرانە نیشانی دوژمن دراوە، بە جۆرێك کە پاش چەند ساڵ خۆ گێل کردن سەدامی خوێنڕێژ ناچار بوو سەهۆڵبەندانی بێ دەنگی بشکێنێ و دەربارەی کورد بدوێ و جنێو بە پێشمەرگەکانی بدات.

هەرێمی ٢ی قارەمان کە چەند مانگ بوو لەبەر پێویستییەکانی پارێزگاریی بنکەو ڕێکخراوو هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە هێرش و گەلەکۆمەکێ لەسەر فەرمانی سەرکردایەتیی یەکێتی نێردرایە ئاسۆس و دۆڵی جافەتی، وە ماوەیەکی تر نێردرایە دەشتی کۆیەو کۆسرەت و خۆشناوەتی..وە ماوەیەکی تریش برایە قەڵاتوکان و بناری قەندیل..وە هەروەکو بە درێژایی تەمەنی پێکهاتنی نمونەی هێزی ئازاو دڵسۆزو دەس وەشێن و خاوەن دیسیپلین بووە.

هەروەکو نمونەی هێزی ڕێکوپێکی خۆشەویستی ناو جەماوەر بووە، هەروەکو نمونەی فیداکاری و لەخۆبران و دەرسی قارەمانەتیی بێ وێنەو نەخشەی وردو پلانی ژیرانەی جەنگی پارتیزانی بووە... هەروەها لەو ماوەیەشدا بەوپەڕی دڵسۆزی لێهاتوییەوە، بەوپەڕی لە خۆبران و گوێڕایەڵی و خۆراگریەوە، هەمیشە لەڕیزی پێشەوەی بەرگری و لەسەنگەرە سەختەکانی پێشەوەدا بووە بۆ پارێزگاری لە یەکێتیی نیشتمانی و بنکەو ڕێکخراوەکانی و بۆ بەدەنگەوە چوونی هێزو هەرێمەکانی ترو بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر هێرشێکی نارەوای هاتبێتە سەریان.

هەرێمی ٢ی قارەمان لەو ماوە کورتەی دواییشدا کە گەڕاوەتەوە سنووری کارو چالاکیی خۆی لە دەوری کەرکوك، چەندین چالاکیی قارەمانانەی ئەنجام داوەو چەند جارێك بە سەرکەوتوویی مەفرەزەی ناردە ناو کەرکوکەوە بۆ دەس وەشاندن لە دوژمن.

هەر بۆیە دوژمنی داگیرکەر هەمیشە لەپێ و شوێنی هەرێمی ٢ی قارماندا بوو، بە وردی تەعقیبی جوڵان و هاتوچۆی ئەکردو لە پەرێزا بوو بۆ ئەوەی نوقتەیەکی زەعیفی بدۆزێتەوەو جەزرەبەیەکی لێ بدات. سەد مەخابن دوژمن توانی فرسەت لەبەشێکی ئەم هێزە قارەمانە بهێنێ و کەڵك وەربگرێ لەو دوورکەوتنەوەیان لە بەشی زۆری هێزەکەیان و مانەوەیان بۆ چەند رۆژێك، لەیەك ناوچەدا، بەڵکو لەناو یەك گوندی نزیك جادەدا.

لە رۆژی (٥ی ئاداری ساڵی١٩٨٢)دا لە کاتێکدا کە مەفرەزەیەکی کەرتی هەرێم و مەفرەزەیەکی کەرتی ٢ی هەرێمی ٢ لەگەڵ فەرماندەی هەرێمەکەدا کە تێکرا، ٢٢ پێشمەرگە بوون لە گوندی قازان بوون. هێزێکی گەورەی دوژمنی داگیرکەر بە پشتیوانیی چەندین هالیکوپتەری جەنگی هێرشی بردە سەریان. لە سەعات ٩ی پێش نیوەڕۆدا شەڕو پێکادان دەستی پێکردو تا سەعات ٨ی شەو شەڕێکی دەستەویەخەی نابەرامبەر لە بەینی ٢٢ پێشمەرگەی دلێری هەرێمی ٢ دا بەسەرکردایەتیی هەڤاڵی قارەمان ئەنوەر حەسەن و نزیکەی دوو هەزار نەفەر لە جاش و جاشی شەعبی و پۆلیس و سوپاو چەند هالیکۆپتەری جەنگی بۆ ماوەی ١١ سەعات درێژەی کێشا. لەم شەڕەدا پێشمەرگە دلێرەکانی هەرێمی ٢ دەرسێکی بێ وێنەی هێزە داگیرکەرەکانی دوژمنیان داداو بە جۆرێکی ئەوتۆ چاوشکێن و تەمێیان کردن کە جارێکی تر نەوێرن هەروا بە ئاسانی یاری بە ئاگر بکەن و چەند زۆرو پۆشتەو حەساوە بن. زات نەکەن پەلاماری پێشمەرگە بدەن چەند کەم و ماندوش بن.

لەم شەڕەدا هێزی دوژمن زیاتر لە ٣٠ نەفەری لێ کوژراو دەیان کەسیشی لێ بریندار کرا کە یەکێکیان سەرەکجاشی تاوانبار قالە فەرەجی خائین بوو. ئەگەرچی لەم شەڕەدا کوشتاری زۆر لە دوژمن کراو زەرەری گەورەی لێ دراوە، بەتایبەتی سەقەت کردنی قالە فەرەجی خائین کە یەکێکە لە سەگە رستکراوە هارەکانی ڕژێم، وە هێزی دوژمن نەیتوانی لە ڕێی بەدەستهێنانی باڵادەستیی ژمارەییەوە بەسەر پێشمەرگەکاندا، مەبەستەکانی خۆی لەڕووی گەمارۆدان و

بەدیل گرتنی پێشمەرگەکانەوە، بەدەس بهێنێ، بەڵام بەداخەوە هێزی پێشمەرگەش زەرەرێکی گەورەیلێکەوت، بە شەهیدبوونی ١٢ پێشمەرگە کە یەکێکیان هەڤاڵی قارەمان ئەنوەر حەسەن فەرماندەی هەرێمی ٢ بوو.

هەڤاڵ ئەنوەر حەسەن لە ساڵی (١٩٥٤) لە شاری کەرکوك لە دایك بووبوو هەر لەوێ قوتابخانەی سەرەتایی و ئیعدادیی تەواو کردبوو، پاشان چوو بۆ کولێژی ئەندازیاری لە زانکۆی بەغدا.

هەڤاڵ ئەنوەر حەسەن ساڵی (١٩٧٣) شەرەفی ئەندامێتیی کۆمەڵەی وەرگرتبوو، وە هەر لەسەر خەباتی سیاسی ساڵی (١٩٧٥) گیراو حوکم درا لە زیندانی ئەبو غرێب تا عەفوی عامی (١٩٧٩)، کە ئەویش لەگەڵ گیراوە سیاسییەکانی تردا بەربوو وە پاش چەند ڕۆژێك لە سەر داوای سەرکردایەتیی یەکێتیی، هاتە ریزی پێشمەرگەوە وەکرا بە رابەری سیاسیی هەرێمی ٢.

هەڤاڵ ئەنوەر لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا نمونەی پێشمەرگەی ئازاو دڵسۆز بوو، لەناو برا پێشمەرگەکانیدا بە تێکۆشەرێکی پشوو درێژی هۆشیارو رۆشنبیرێکی ئازای خۆگرو فەرماندەیەکی ژیرو خاکی ناسرابوو، ساڵی (١٩٨٠) لەگەڵ دەستەیەك کادری عەسکەری هەڵبژێردرا بۆ مەشقکردن لەناو فەلەستینییەکاندا، پاش ئەوەی بە سەرکەوتویی گەرایەوە کرا بە فەرماندەی هەرێمی ٢ی هێزی پێشمەرگە.

لەژیانی پێشمەرگایەتیدا سەرپەرشتیی دەیان هەڵمەتی دلێرانەی پێشمەرگە قارەمانەکانی هەرێمی ٢ و سەرکردایەتیی چەندین شەرو نەبەردی کردووەو نەخشەی دەیان چالاکیی بۆ داناون.

لە ژیانی زینداندا نموونەی تێکۆشەری خۆگرو ئازاو بەرچاو بوون و خاوەن ورەو سەربەرز بوو.. لە ژیانی سیاسیدا تێکۆشەرێکی جەماوەریی گونجاوو رۆح سووك و ژیرو تێگەیشتووو ئەمین بوو.. هەر لەبەر ئەمانە لەیەکەمین کۆنفرەنسی کۆمەڵەدا بە گشتیی دەنگ هەڵبژێردرا بە ئەندامی دەستەی بەرێوەبەرایەتیی کۆنفرەنس.

شەهیدبوونی هەڤاڵ ئەنوەر خەسارەتێکی گەورە بوو لە جولانەوەی شۆرشگێرانەی گەلەکەمان بە شەهید بوونی ئەو هێزی پێشمەرگەی کوردستان کادرێکی عەسکەریی لێوەشاوەو قارەمان، وە یەکێتیی نیشتمانی و کۆمەڵەش کادرێکی سیاسی و رێکخراوەیی کارامەو بەتوانای لە کیس چوو... شەهید ئەنوەر چۆن لە خەباتی سیاسی و پێشمەرگەییدا لەگەڵ پێشمەرگە قارەمانەکانی هەرێمی ٢ سەرقافلە بوو لە شەهید بوونیشدا هەروەها بوو، وە لەگەڵ ئەم ١١ قارەمانی تری هێزی پێشمەرگە شەهید بوون:

١- هەڤاڵ رزگار جەلال ناسراو بە هێمن.
٢- هەڤاڵ مامۆستا عبدولخالق ساڵح ناسراو بە ئاسۆ.
٣- هەڤاڵ مامۆستا عەبدوڵڵا ساڵح ناسراو بە چیا.
٤- هەڤاڵ سوارە شێخ سدیق.
٥- هەڤاڵ کامەران مام عومەر.
٦- هەڤاڵ سیروان کوێخا نەجم.
٧- هەڤاڵ کەریم چەمچەماڵی ناسراو بە گۆران.
٨- هەڤاڵ نوعمان عەبدی.
٩- هەڤاڵ حەمە شوکر بلوکێنی
١٠- هەڤاڵ نەجمەددین فاتیح ناسراو بە شیروان
١١- هەڤاڵ موەفەق تەقی.

بەڵێ ١٢ قارەمانی هەرێمی ٢ شەهید بوون.

١٢ کەسی قارەمانی کەرکوك و دەوروبەری کەرکوك شەهید بوون و گیانیان گەیشتە بەهەشتی نەمری و کاروانی شەهیدانی رێگای رزگاریی کوردستان و بەمجۆرە داستانێکی تری سەروەرییان لە مێژووی گەلەکەمانداو داستانێکی تری بەرگریی قارەمانانەیان لە پێناوی پاراستنی شەرەف و نەتەوەو نیشتمانەکەمان، لە هێرشی سوپای داگیرکەری رژێمی فاشیستی عێراق و نۆکەرە چلکاو خۆرەکانی، بە خوێنی خۆیان نوسییەوە، ئەگەرچی ئەم پۆلە شەهیدە بەسەربەرزی رۆیشتن، بەڵام هەرێمی ٢ی قارەمان ماوە، هێزی لە شکان نەهاتووی پێشمەرگەی کوردستان ماوە، گەلی کورد ماوەو لەسەنگەری خەباتی شۆرشگێرانە دایە، ئاڵای بەرزی شۆرش، کە سوورە بە خوێنی شەهیدەکانی، بە زوور سەریانەوە ئەشەکێتەوە.

*** چالاکی بازگەی کەرکوك:-**

ئۆپەراسیۆنێکە مەفرەزەیەکی تیپی (٢١)ی کەرکوك لە شەوی ٢٣ی لە سەر ٢٤ی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٨٢) ئەنجامی داوەو تێیدا بازگەی (کەرکوك - سلێمانی) لە دەروازەی کەرکوك کۆنترۆڵ کرا، ئەو مەفرەزەیەی کە ئەم ئۆپۆراسیۆنەی ئەنجام دا لە نۆ پێشمەرگە بە فەرماندەیی (کەریم محەمەد ئەمین رەزا، ناسراو بە کەریمە نۆ و کەریمە ریشە) پێکهاتبوو بازگەکە یەك کیلۆ مەتر لە گەرەکی ئیسکانی تازەوە دوور بوو. لەبەر نزیکیی بازگەکە لە کەرکوك، دەبوایە ئۆپەراسیۆنەکە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ئەنجام بدرێ ولەم سۆنگەیەوە پێشمەرگەکان هێرشێکی کتوپڕیان کردە سەر ئەمن و سەربازو پۆلیسەکانی بازگەکەو بە چاو تروکانێك دەستیان بەسەردا گرت، بەڵام یەکێ لە بریندارەکانی بازگەکە دەسترێژێکی کردو دوو پێشمەرگەی شەهید کرد کە بریتی بوون لە (عادل رەشید)و فەرماندەی مەفرەزەکە (کەریم محەمەد ئەمین رەزا) ئەم ئۆپەراسیۆنە دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو، چونکە یەکەم جار بوو پێشمەرگە بتوانێ ئەوەندە لە کەرکوك نزیك ببێتەوەو دەست لە شوێنێك بوەشێنێ کە تەنها یەك کیلۆ مەتر لە کەرکوکەوە دوورە.

*** چالاکی گوندی ساڵەیی:-**

چالاکییەکی هێزی پێشمەرگەیە لە سنووری تیپی ٥٧ی سەگرمە بە فەرماندەیی مامە ریشە لە ١٥ی تەموزی ساڵی (١٩٨٢) لە نزیك گوندی ساڵەیی لە ناوچەی جەباری. لەم چالاکییەدا پێشمەرگەکان بۆ سەیان دانا. تانکەرێکی ئاوی سەر بەسوپای عێراق کەوتە بۆسەکەوە، درایە بەر گوللەو هەمو سەرنشینەکانی کوژران. زۆری نەخایاند دوو ئۆتۆمبیلی هینۆی پڕ چەکداری جەیش شەعبی کەوتنە هەمان بۆ سەوە.

هێزێكی تری سەربازو جاش بۆ شوێنی بۆسەكە نێردران و تا شەو شەڕ درێژەی كێشا. دوژمن نزیكەی ١٥ سەربازو چەكداری جەیش شەعبی و جاشی لە پێكادانەكان لە دەستدا. هێزی پێشمەرگە هیچ زیانێكی نەبوو، دەستكەوتەكانیش بریتی بوون لە ١٠ ئاربیجی و ڕەشاشێكی ئاربیكەی و چەند كلاشنكۆفێك.

*** چالاكی گوندی حەمك:-**

شەڕێكی دەستەویەخەی ناو دێیە لەنێوان مەفرەزەیەكی كەرتی ٤ی جەباریی سەر بە تیپی ٥٥ی قەرەداغ و هێزێكی بەربلاوی سوپای عێراق لە ١٧ ی ئاباری ساڵی (١٩٨٢) لە گوندی حەمك لە ناوچەی جەباری. مەفرەزەكەی پێشمەرگە كە بەفەرماندەیی مامە ریشە بوو، خۆی بۆ بەرچدانەوەی هێرشەكەی سوپای عێراق ئامادە نەكردبوو، لە كاتێكدا كە هێزەكانی عێراق هێرشیان كردە سەر گوندەكە، نەخشەیەكی وایان بەدەستەوە بوو كە تەواوی پێشمەرگەكان گەمارۆ بدەن و دواتر لە ناویان بەرن، بۆیە ئەو هێزەی بۆ ئەنجامدانی ئەم ئۆپەراسیۆنە بەرەو حەمك بەڕێكەوت، هەموو ڕێوبانەكانی دەربازبوونی پێشمەرگەی گرتبوو. ئەو هێزە لە ٣ فەوج بەفەرماندەیی لیوا عەبدولكەریم حەمدانی، ژمارەیەك زرێپوش، بەپاڵپشتیی ٨ هەلیكۆپتەری جەنگی و ٤ هەلیكۆپتەری بارهەڵگرو چەند مەفرەزەیەكی جاش پێكهاتبوو.

پێشمەرگەكان لەبەر زەبەلاحیی هێزەكەی دوژمن، شەڕی مان و نەمانیان كردو جگە لەناو گوند شوێنێكی تریان نەبوو شەڕی تێدا بكەن، بۆیە بەهۆی كون كردنی دیواری ماڵەكانەوە هەموو خانووەكانی گوندەكەیان بەیەكترییەوە بەستەوە. شەڕێكی دەستەویەخە لەناو گوند ڕوویدا، بەڵام ئەم دەستەویەخەییە بەقازانج بۆ پێشمەرگەكان شكایەوە، چوونكە بووە مایەی دەستەبەركردنی فیشەكی پێویست بۆ پێشمەرگە. هەر كە لە دوژمن دەكوژرا، پێشمەرگەكان فیشەك و نارنجۆكی كوژراوەكانیان بەكار دەهێناو بەهۆی ئەمەوە بەدرێژایی شەڕ فیشەك لە پێشمەرگەكان نەبرا.

بۆ ئێوارە هێزەكانی سوپا، پاش ئەوەی ژمارەیەكی زۆر سەربازو جاشیان لێ كوژرا، گوندەكەیان بەجێ هێشت و بۆ چەمچەماڵ گەڕانەوە. هێزی پێشمەرگە ٤ شەهیدی هەبوو كە بریتین لە وەهاب ئەحمەد محەمەد (فەتاح)، عەلی كەریم ئەمین، ستار محەمەد مستەفاو ئەحمەد عەبدولرەحمان (هاوار)و ٣ پێشمەرگەی تریش بریندار بوون، لەوانە فەرماندەی هێزەكە مامە ریشە، مەفرەزەكەی پێشمەرگە لە ١٠ پێشمەرگە پێكهاتبوو.

*** چالاكی گوندی قادر كەرەم:-**

چالاكییەكی هێزی پێشمەرگەی تیپی ٥٧ی سەگرمەیە لەساڵی (١٩٨٣) لەسەر ڕێگای قادر كەرەم - لەیلان. لە ١٩ی كانونی دووەمی (١٩٨٣) پێشمەرگەكانی كەرتی ٤ی تیپی ٥٧ی سەگرمە بۆسەیان لەسەر ڕێگای قادر كەرەم - لەیلان دانا. هێزێكی سوپا كەوتە بۆسەكەوە. پێشمەرگەكان دایانە بەر ڕێژنەی گوللەو تەنگیان پێ هەڵچنی هێزە گیر خواردووەكە داوای هێزی فریادرەسی كردو لەم سەروبەندەدا هێزێكی تری كە چوار زرێپۆش پێكهاتبوو بە فریای هێزە گیرخواردووەكە چوو. دوژمن لەشەڕەكەدا بەهاوەنی ١٠٦ ملم لە هێزی پێشمەرگەی دا.

شەڕ لەسەعات ١٧وە تا سەعات ٢٠ درێژەی كێشاو وردە وردە هێزەكانی سوپا بەشپرزەیی دەستیان بەكشانەوە كرد. بەشێك لەو هێزانە لە نزیك گوندی باوە كەوتنە بۆسەیەكی دیكەی هێزی پێشمەرگە. لە كاتی كشانەوەكەشدا یەكێك لە زرێپۆشەكان وەرگەڕا.

لەئاكامی ئەم شەڕەدا هێزەكانی عێراق كوژرانی ٢ ئەفسەرو ١١ سەربازی كۆماندۆو ٢٠ چەكداری جەیش شەعبی و برینداربوونی چەند سەربازێكیان زیان لێكەوت، سەرباری وێرانبوونی سێ ئۆتۆمبیل. هێزی پێشمەرگە یەك پێشمەرگەی لێ بریندار بووو یەك كلاشینكۆف و یەك دەمانچەو هەندێ تەقەمەنیی چنگ كەوت.

*** چالاكی گوندی تەپەلوو:-**

شەڕێكە لە ٢٨ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٣ لەنێوان مەفرەزەیەكی كەرتی ٤ی جەباریی سەر بە تیپی ٥٧ی سەگرمەو هێزێكی گەورەی جاش لە گوندی تەپەلووی ناوچەی جەباری. مەفرەزەكە لە گوندی سیامەنسوور تاوتوێی چالاكییەكی بۆ هێرشكردنە سەر ڕەبییەكی نێوان هەردوو گوندی مامشەو تاوێرەبەرز دەكرد، بەڵام دواتر مەسەلەكە لەسەر ئەنجامدانی چالاكییەك لە نزیك گوندی گوندی تەپەلوو گیرسایەوە.

*** چالاكی بێكەس:-**

ڕووداوی شەهیدبوونی سێ پێشمەرگە لە گەڕەكی بێكەسی شاری چەمچەماڵ لە ساڵی (١٩٨٣). بەپێی نەخشەی دانراو. سێ پێشمەرگەی كەرتی ٣ی تیپی ٥٧ی سەگرمە بەناوی محەمەد نادر قادرو بەكر بارۆیی و مەجید قادر عەزیز ناسراو بە سۆرانی پورە گوڵە، بەشەو چوونە ناو شاری چەمچەماڵ بەمەبەستی هێرش كردنە سەر بارەگای پارتی شۆڕشگێڕی كوردستانی سەر بەرژێمی بەعس لە گەڕەكی بێكەس. بەڵام چالاكییەكە لەبەر بوونی هێزێكی زۆر لەناو شار ئەنجام نەدراو سێ پێشمەرگەكە بڕیاریاندا ئەو شەوە لە ماڵی محەمەد نادر قادر لە گەڕەكی بێكەس بمێننەوە.

بەیانییەكەی، دەزگا ئەمنییەكان هەواڵیان پێگەیشت كە چەند پێشمەرگەیەك هاتونەتە ناو چەمچەماڵ و لە ماڵێكی گەڕەكی بێكەس دان. لەو كاتەدا هێزێكی گەورە لە ناو شار بۆ ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنێكی گەورە لە ناوچەی زەنگنە مۆڵ درابوو كە لە لیوای چەمچەماڵ و جاشەكانی چەمچەماڵ و تا سلوجەو بازیان و هێزی جەیش شەعبیی سنوورەكە پێكهاتبوو. پاش دەستنیشانكردنی ئەو ماڵەی پێشمەرگەكانی لێ بوو، هێزەكە لە هەموو لایەكەوە هێرشی كردە سەر ماڵەكە. جگە لە چەكی سووك، هاوەنی ١٠٦ ملم و ئارپیجیش لە هێرشەكەدا بەكار هات. هێرشەكە سەعات

١٠ی بەیانی دەستی پێکردو شەڕێکی سەخت بۆ ماوەی پێنج سەعات دامەزرا کە لە کۆتاییدا هێزەکانی عێراق ناچار بوون هانا بۆ بەکارهێنانی هەلیکۆپتەری جەنگی ببەن کە ماڵەکانی گەڕەکەکەی دایە بەر موشەك، سەرباری ئەوەی کە فڕۆکەی سیخۆڕی بە سەر شارەکەدا دەسووڕایەوەو تۆپ و تانك دەوروبەری شاری تەنی بۆوە. لەناو شاریش بەبڵند گۆ داوای خۆ بەدەستەوەدانی پێشمەرگەکان دەکرا.

هێزەکانی عێراق نەخشەی گەمارۆدان و لە ناوبردنی پێشمەرگەکایان دانابووو وا تێگەیشتبوون گەڕەکەکە هێزێکی گەورەی پێشمەرگەی لێیە. هەموو ئەو هێرشانەی لە ماوەی پێنج سەعاتدا کرانە سەر پێشمەرگەکان تێکشکێنران و لە کۆتاییدا هێزەکانی عێراق زۆرتر کەوتنە بەکارهێنانی هاوەن و موشەکباران کردنی گەڕەکەکە لە ڕێی هەلیکۆپتەری جەنگییەوە.

شەڕەکە بەشەهیدبوونی هەر سێ پێشمەرگە کۆتایی هات. کۆی کوژراوی دوژمن گەیشتە ٦ کەس کەیەکێکیان فەرماندەی مەفرەزەی تایبەت بوو، لەگەڵ دوو چەکداری جەیش شەعبی و ٣ جاش. ژمارەی بریندارانیش لەسەرووی ١٠ کەس بوو. لە ئاکامی هێرشەکان و تۆپباران و بەکارهێنانی موشەکدا، سێ خانووی گەڕەکەکە رووخان و زیاد لەدە خانووی تر گڕیان تێ بەربوو.

لەم سەروبەندەدا پێشمەرگەکانی کەرتی ٣ی تیپی ٢١ی کەرکوك لە هەوڵێکدا بۆ فریاکەوتنی پێشمەرگە گەمارۆدراوەکان، چوونە گوندی گورگەی نزیك چەمچەماڵ بەڵام لەبەر گەمارۆی سەر شار نەیانتوانی بچنە ناو چەمچەماڵ و فریای پێشمەرگەکان بکەون.

سەرەڕای ئەمە، هەر ئەو شەوە پێشمەرگاکانی کەرتی ٤ی جەباری بە فەرماندەیی نەجمەدین مام شوکر تاڵەبانیی ناسراو بەمامە ریشە خۆیان کرد بە چەمچەماڵداو هێرشیان کردە سەر قەڵای چەمچەماڵ و چەند بنکەیەکی جاشەکان.

ئەم شەڕە دەنگدانەوەیەکی گەورەی لە ناوچەکەدا هەبوو. ڕۆژی دوای شەڕەکە وەك گوزارشتێك لە خەم و پەژارە بەرامبەر بە شەهیدبوونی سێ پێشمەرگەکە، هیچ دوکان و بازاڕێکی چەمچەماڵ نەکرایەوە.

ساڵی (٢٠١٢) بەبڕیاری شارەوانیی چەمچەماڵ ناوی گەڕەکی بێکەس گۆڕاو کرایە گەڕەکی پورە گوڵە کە دایکی یەکێ لە سێ پێشمەرگە شەهیدەکەیەو پێشتریش کوڕێکی تری لە شەڕی قازان شەهید بوو.

محەمەد نادر قادر: لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٧)ی شاری چەمچەماڵ. لە خێزانێکی جوتیاری کوردپەروەردا چاوی بە ژیان هەڵهێناوە. ساڵی (١٩٧٧) پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە.

لە ساڵی (١٩٨٠) بووەتە پێشمەرگە لە هەرێمی ٥ی قەرەداغ. ساڵی (١٩٨٢) پاش هەڵوەشاندنەوەی سیستمی هەرێمەکان و کارکردن بەسیستمی تیپەکان، بەر سنووری هەڵسوورانی تیپی ٥٧ی سەگرمە کەوت. لەژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی لە ژمارەیەکی زۆری چالاکییەکانی تیپەکەیدا کردووە لەوانە شەڕی چیای شۆڕاوەی ناوچەی هەمەوەند لە ساڵی (١٩٨٠)و شەڕی ژاڵەی دەربەند لە بناری چیای سەگرمە لەساڵی (١٩٨٢).

هەروەها بەشدار بوو لە شەڕەکانی هێزی پشتیوان لە ساڵی (١٩٨٢) لە کوردستانی ڕۆژهەڵات. لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا دوو جار برینداا بووە، جارێك لە ساڵی (١٩٨١) لە چالاکییەکدا لە ناو شاری چەمچەماڵ لە کاتی هێرشکردنە سەر بنکەی پۆلیس و جاری دووەم لە ساڵی (١٩٨٢) لە شەڕەکانی هێزی پشتیوان.

مەجید قادر عەزیز: ناسراو بە سۆرانی پورە گوڵە. لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٦)ی شاری چەمچەماڵ. لە خێزانێکی هەژارو دەستکورت چاوی بە دنیا هەڵهێناوەو بە هۆی هەژارییەوە نەیتوانیوە درێژە بە خوێندن بدا، بۆیە لە هەرزەکارییەوە شانی داوەتە بەر کاری کرێکاری. پورە گوڵەی دایکی، ئەوو براکەی بە هەژاری و بێوەژنی بە خێو کردووە.

ساڵی (١٩٧٩) لە چەمچەماڵ پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵە رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو ئەم ڕووداوە کاریگەریی زۆری لەسەر گەشەکردنی هۆشیاریی چینایەتی و نەتەوایەتیی بەجێ هێشتووە. هەر هەمان ساڵ بووەتە پێشمەرگە لە هەرێمی ٢ی کەرکوك و ساڵی (١٩٨٢) گوێزراوەتەوە بۆ هەرێمی ٥ی قەرەداغ.

لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا ڕۆڵێکی دیاری هەبووەو بەشدار بووە لەبەشێکی زۆری چالاکییەکانی سنووری هەردوو هەرێمی ٢ی کەرکوك و٥ی قەرەداغ، هەروەها بەشداریش بووە لە ئۆپەراسیۆنەکانی هێزی پشتیوان لە کوردستانی ئێران و لەو ماوەیەدا چەند جارێکیش بریندار بووە.

برایەکی بەناوی گۆران لە ساڵی (١٩٨١) لە شەڕەکەی قازان لە نزیك تاسلوجە شەهید بووە. پورە گوڵەی دایکی هەر ئەم دوو کوڕەی هەبووە. چیرۆکی شەهیدبوونی ئەم دوو برایە بە چەشنێك کاریگەر بووە کە چیرۆکنوس محەمەد نوری تۆفیق چیرۆکی (گورگانە شەوێ)ی لەسەر نووسیون. لە چەمچەماڵ زۆر جار لەسەر دیوارەکان ئاماژە بەم برایە کراوەو بەدروشم نوسراوە (شەهید سۆران و گۆران نموونەن بۆ ڕەنجدەران).

بەکر بارۆیی: لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٠)ی گوندی بارۆیی لە ناوچەی بازیان. لە بنەماڵەیەکی جوتیاری هەژار بووە. ساڵ (١٩٦٨) لە خوێندنگەی چوارباخی سلێمانی خراوەتە بەر خوێندن و بەهۆی هەژارییەوە وازی لە خوێندن هێناوەو بۆ دابین کردنی بژێوی خێزانەکەی دەستی بەکرێکاری کردووە. ساڵی (١٩٨٠) پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردووەو لەبارەگای ناوەندی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لەناوزەنگ خزمەتی کردووە. ساڵی (١٩٨٢) گوێزراوەتەوە بۆ کەرتی ٣ی تیپی ٥٧ی سەگرمە لەو ماوەیەدا بەشداریی کاریگەری لە چالاکییەکانی تیپەکەدا کردووە، سەرباری بەشداریی لە ئۆپەراسیۆنەکانی هێزی پشتیوان لە کوردستانی ئێران. بەکر چواردەهەمین شەهیدی گوندی بارۆییە.

*** چالاکی گوندی کانی سپیلکە:-**
چالاکییەکی هێزی پێشمەرگەی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵانە لە ساڵی (١٩٨٥)دا کە ١١ شەهیدی لێکەوتووەتەوە. پاش سێ مانگ دابران لە ناوچەکانی گەرمیان و خاڵخاڵان، بەهۆی بەشداری کردن لە شەرەکانی کێوەرەش و دۆڵەرەقەو دۆڵی ئاکۆیان و شەرەکانی بەرگری کردن لە سنووری مەڵبەندی سێ، پێشمەرگەکانی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان گەرانەوە بۆ سنووری چالاکیی خۆیان.
شەوی ١٤ لەسەر ١٥ی ئەیلولی ساڵی (١٩٨٥) بەپێی پلانێك کە دواتر دەرکەوت زۆر کەموکوریی تێدایە، سەرجەم کەرتەکانی تیپەکە هەڵیانکوتایە سەر دوو رەبییەکەی گوندی کانی سپیلکەی سەر رێگای گشتیی ئاغجەلەر - تەکیە بە هۆی تەقینەوەی ژمارەیەکی زۆری ئەو مینانەی کە لە دەورووبەری هەردوو رەبییەکە چێنرابوون، هێرشەکە ئامانجەکانی نەپێکاو ١١ پێشمەرگە شەهیدو ٢٣ پێشمەرگەی تر بریندار بوون، هۆی ئەو زیانە گەورەیە پەیوەندیی بەوەوە هەبوو کە زانیارییەکانی بەردەستی تیپەکە دەربارەی ژمارەو جێگەی مینە چێنراوەکانی دەورووپشتی رەبییەکان راست نەبوون.
پێشمەرگە شەهیدەکان: کامەران تەها فەرەج مەحمود، عەلی ئەمین فەتاح عەلی، عەبدوڵڵا محەمەد برایم، یاسین سەلام ساڵح خدر، محێدین ئەحمەد محەمەد، کاوێز حەوێز عومەر، فازڵ عەلی سەعید، ئەمین عەبدولکەریم، عەزیز محەمەد ساڵح، جومعە عەبدولکەریم محەمەد ساڵح و عومەر محەمەد عەبدوڵڵا خدر.

*** ژیاننامەی شەهیدەکان**
- کامەران تەها فەرەج مەحمود.
ناسراو بە کامەران بیکەیسی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٢)ی گەرەکی تەپەی شاری کەرکوك. ساڵی (١٩٧٩) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو ساڵی (١٩٨٢) بووەتە پێشمەرگەی تیپی ٢١ ی کەرکوك.
ساڵی (١٩٨٤) دوای جیابوونەوەی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان لە تیپی ٢١ی کەرکوك، گواستراوەتەوە بۆ تیپە تازەکە.
- عەلی ئەمین فەتاح عەلی.
ناسراو بە عەلی حاجی ئەمین کارێزەیی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٥)ی گوندی کارێزەی خاڵخاڵانی سەر بە ناحیەی شوان. ساڵی (١٩٨٠) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو ساڵی (١٩٨٥) لە تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان بووەتە پێشمەرگە.
- عەبدوڵڵا محەمەد برایم.
ناسراو بە عەبدوڵڵا قەرەناوی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٧)ی گوندی قەرەناوی ناوچەی شوان. ساڵی (١٩٨٣) پەیوەندیی بەریزەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو ساڵی (١٩٨٥) لە تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان بووەتە پێشمەرگە.
- یاسین سەلام ساڵح خدر.
لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٧)ی گوندی تەقتەقی ناوچەی شوان. لەگوندی گەزەڵان تا پۆلی سێیەمی سەرەتایی خوێندووە. ساڵی (١٩٨٥) بووەتە پێشمەرگەی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان.
- محێدین ئەحمەد محەمەد.
ناسراو بە محێدین بێکەس چەمچەماڵی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٨)ی گەرەکی بێکەسی شاری چەمچەماڵ. تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی خوێندووە.
ساڵی (١٩٨١) پەیوەندەیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو ساڵی (١٩٨٢) ویستویەتی ببێ بە پێشمەرگە بەڵام بەهۆی کەمیی تەمەنییەوە وەرنەگیراوە. دواتر لە ساڵی (١٩٨٥)دا لە تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان بووەتە پێشمەرگە.
- کاوێز حەوێز عومەر.
ناسراو بە کاوێز مۆرخوادەیی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٤) ی گوندی مۆرخوادەی بناری چیای خاڵخاڵان لەناوچەی ئاغجەلەر. ساڵی (١٩٧٧)ماڵیان گواستووەتەوە بۆ کەرکوك و لەوێ نیشتەجێ بوون، ساڵی (١٩٨٥) لە تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان بووەتە پێشمەرگە.
- فازڵ عەلی سەعید.
ناسراو بە شێرکۆ. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٦)ی شارۆچکەی شوان. تا پۆلی شەشەمی سەرەتایی خوێندووە.
ساڵی (١٩٨٢) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو ساڵی (١٩٨٥) بووەتە پێشمەرگەی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان.
- ئەمین عەبدولکەریم.
ناسراو بە ئەمین قەسرۆکی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٥) ی گوندی قەسرۆکی ناوچەی ئاغجەلەر. ساڵی (١٩٧٦) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو ساڵی (١٩٨١) بووەتە پێشمەرگە لەهەرێمی پارێزگاری. ساڵی (١٩٨٣) وازی لە پێشمەرگایەتی هێناوەو لە ساڵی (١٩٨٥)دا جارێکی تر پەیوەندیی بە هێزی پێشمەرگەوە کردووەتەوەو بووەتە پێشمەرگەی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان.
- عەزیز محەمەد ساڵح.
ناسراو بە بارام. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦١)ی گوندی سۆنەگۆلی دەورووبەری شاری کەرکوك. ساڵی (١٩٧٨) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو لە کەرتی رێکخستنی چەمچەماڵ کاری کردووە. ساڵی (١٩٨٢) بووەتە پێشمەرگەی تیپی ٢١ی کەرکوك و پاش پێکهێنانی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان بۆ ئەم تیپە گوازراوەتەوەو کراوەتە رابەری سیاسیی کەرتی ٣ی تیپەکە.
- جومعە عەبدولکەریم محەمەد ساڵح.
ناسراو بە جومعە ریشە کەرکوکی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٥)ی گەرەکی ئیمام قاسمی شاری کەرکوك. قۆناغی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندەیی لەوێ تەواو کردووە.
ساڵی (١٩٨٢) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو لە کۆمیتەی ئاگر کاری کردووە. ساڵی (١٩٨٣) بووەتە پێشمەرگەی تیپی

٢١ی کەرکوك‌و لە ساڵی (١٩٨٤)دا بۆ تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان گواستراوەتەوە.
- عومەر محەمەد عەبدوڵڵا خدر.
لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٥)ی گوندی کانی هەنجیری ناوچەی ئاغجەلەر. بەهۆی هەژارییەوە ژیانی ناسەقامگیر بووەو لە ناوچەکانی ئاغجەلەرو شوان‌و بازیان ژیانی بردۆتە سەر. ساڵی (١٩٨٥) بووەتە پێشمەرگەی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان.

* چالاکی گوندی ئۆمەرە گەدە:-
شەڕێکە لە ٥ی ئەیلولی ساڵی (١٩٨٥) لە گوندی ئۆمەرە گەدە لە ناوچەی جەباری لەنێوان پێشمەرگەکانی کەرتی ڕێکخستنی بازیان‌و کەرتی ٤ی جەباری‌و هێزێکی گەورەی سوپای عێراق‌و جاش.
لەم شەڕەدا هێزێکی سوپای عێراق بەپاڵپشتی جاشەکان گەمارۆی گوندی ئۆمەرە گەدەی دا کەپۆلێك پێشمەرگەی کەرتی ڕێکخستنی بازیان‌و کەرتی ٤ی جەباریی لێ بوو. شەر لەبەیانییەوە تا ئێوارە درێژەی کێشاو هێزەکانی عێراق پێنج جار هێرشیان کردە سەر گوندەکەو لە هەر پێنج هێرشدا تێکشکان. لەم شەڕەدا هێزەکانی عێراق تانك‌و فڕۆکەی پیلاتۆزو هەلیکۆپتەری جەنگییان بەکار هێنا، هەم بەهاوەن گوندەکەیان بۆردومان کردو هەم لە چەمچەماڵەوە تۆپی نەمساوییان بەکار هێنا. شەر دە سەعاتی خایاندو لەو ماوەیەدا پۆلێك پێشمەرگە کە لە گوندی تەی مەزاوە بوون، بەفریای پێشمەرگەکانی ناو ئۆمەرە گەدە چوون‌و لایەکی گەمارۆی دوژمنیان شکاند. لەناو گوندیش پێشمەرگەکان بە بەکارهێنانی ئاربیجی، پێشڕەویی تانکەکانیان ڕاگرت. لە کۆتاییدا هێزەکانی دوژمن بەبێ ئەوەی ئامانجەکانیان بەدی بێنن، کشانەوە. شەڕەکە کوژرانی ٧٠ سەربازی کۆماندۆ‌و جاشی لێکەوتەوە. هێزی پێشمەرگە یەك شەهیدی بەناوی سەبور ئەحمەد محێدین هەبوو کەدواتر تەرمەکەی لە گوندی دێرەشە بەخاك سپێردرا.
ناوی هەندێ لەو پێشمەرگانەی کەبەشدارییان لەم شەڕەدا کردووە. ئەحمەد عەسکەری بەرپرسی کەرتی ڕێکخستنی بازیان، کەریم حەمید ئاغای زەنگنە ئەندامی کەرتی ڕێکخستنی سنووری کەرتی ٥و باسەرە، شوان جەباری ئەندامی کەرتی ڕێکخستنی جەباری، چیا چەمچەماڵی، یاسین بچکۆل، سەمەد گلی، شەماڵ ئۆمێك، مەسعود جەباری، مەدحەت جەباری، سەبوور ئەحمەد محێدین، ڕزگار تەپەلویی، نەجات تەپولیی، یاسین خەجێ، سەیاح فاتیح، سەباح فاتیح، ڕەفعەت خالە بازیانی، حەسەن قەرەوەیسی، عادل نادر.

* چالاکی گوندی گۆپتەپە:-
شەڕێکە لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزێکی بەربڵاوی سوپای عێراق‌و جاش بەپاڵپشتی ١٧ تانك‌و ٢ زرێپۆش‌و ٦ هەلیکۆپتەری جەنگی‌و ٢ فڕۆکەی پیلاتۆزو ٤ تۆپی دوورهاوێژ لە ٧ی شوباتی ساڵی (١٩٨٥) لە گوندی گۆپتەپە لە سنووری ناوچەی ئاغجەلەر. پێشمەرگەکانی تیپی ٢١ی کەرکوك‌و تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان‌و مەفرەزەیەکی سەر بەمەکتەبی عەسکەری‌و مەفرەزەیەکی سەر بەمەکتەبی کۆمەڵایەتیی بەرپەرچی هێرشەکەی دوژمنیان بۆ سەر گوندی گۆپتەپە دایەوە. پاش ١٤ سەعات شەڕکردن هێرشەکە شکاو هێزەکانی دوژمن بەرەو چەمچەماڵ پاشەکشەیان کرد.
لەم شەڕەدا دوژمن ٢٩ سەربازو ٤٢ جاشی لێ کوژراو ژمارەیەکی زۆر برینداریشی هەبوو. لە هێزی پێشمەرگە کەماڵ مەحمود بەرپرسی دادگای سنوورەکەو دوو پێشمەرگە بەناوی ئیسماعیل عەزیز ساڵح‌و زوهێر سەعدون شەهید بوون. لەئاکامی شەڕەکەدا زیانێکی ماددیی زۆر بەرخەڵکی کەوت‌و خودی گوندەکەش کاول بوو.
هێرشەکەی هێزەکانی ڕژێمی عێراق لە تۆڵەی شاڵاوی ١ی شوباتی تیپەکانی ٨٥ی بەرانەتی‌و ٨٦ی دەشتی هەولێرو ٨٧ی قەرەچوخ بوو دژ بەو خێڵە عەرەبانەی کە ڕژێمی عێراق لە چوارچێوەی پرۆسەی بەعەرەبکردندا لەناوچەکانی باشووری هەولێرو شارۆچکەی ڕێدارو گوندەکانی دەربەندی گۆم‌و گورزەیی نیشتەجێی کردبوون.
گۆپتەپە: سەرەڕای وێرانبوونی گوندەکە، دانیشتوانەکەی گوندەکەیان ئاوەدان کردەوە. گوندەکە تا ئایاری ساڵی (١٩٨٨) دا بەئاوەدانی مایەوە. لە ٣ی ئایاری ساڵی (١٩٨٨)دا لە شاڵاوی ئەنفالی چواردا، گوندەکانی گۆپتەپەو عەسکەرو مایلەو سەرچاو شێخان‌و کەڵەشێرەو چەمی ڕێزان‌و قۆچەبلاخ‌و زەرزێ درانە بەر چەکی کیمیایی‌و ئەم هێرشە کیمیاییە ژمارەیەکی یەکجار زۆری دانیشتوانی عەسکەرو گۆپتەپەی کوشت‌و بریندار کرد.
بۆ ڕۆژی دواتر هێزێکی بەربڵاوی سوپا بەپاڵپشتی فڕۆکەی جەنگی‌و هەلیکۆپتەرو پیلاتۆز لە چەند قۆڵێکەوە هێرشی کردە سەر ناوچەکە، لەوانە لە قۆڵی چەمچەماڵەوە بۆ سەر ئاغجەلەرو گۆپتەپەو گەلناغاج‌و سەرچنار. لە ئاکامی ئەم هێرشەدا ژمارەیەکی دیکەی خەڵکی گۆپتەپە کوژران‌و بەشێکیشیان ئەنفال کران.

* چالاکی گوندی تاوێرە بەرز:-
چالاکییەکی هێزی پێشمەرگەیە لەسەر ڕێگای قادر کەرەم - کەرکوك. لە ٢٤ی تەموزی ساڵی ١٩٨٥دا هێزێکی تیپی ٥٧ی سەگرمە هێرشی کردە سەر ڕەبییەی تاوێرە بەرز لەسەر ڕێگای قادر کەرەم - کەرکوك‌و دەستی بەسەردا گرت. لە ئاکامی هێرشەکەدا جاشێکی خەڵکی هەڵەبجە کوژراو پێنج جاشی دیکەش کەهەر هەمویان خەڵکی زەرایەن بوون، بەدیل گیران. هێزی پێشمەرگە یەك شەهیدی بەناوی ڕەحمان تۆفیق هەبوو. دەستکەوتی چالاکییەکە ٦ پارچە چەك‌و دەزگایەکی بێسیمی ١٠٥و هەندێ کەلوپەل بوو.

* چالاکی توکن:-
شەڕێکە لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزێکی گەورەی عێراق کە لە ٢٥ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٨٥) هێرشێکی بەربڵاوی کردبووە سەرگوندی توکن لە ناوچەی کفری.
بەیانیی ئەو ڕۆژە، هێزەکانی عێراق بەهاوەن کەوتنە بۆردومان

کردنی گوندەکەو دوا بەدوای بۆردومانەکە، هێزێکی گەورە بەپاڵپشتی تانك‌و هەلیکۆپتەری جەنگی هێرشی بردە سەر گوندەکە.

گوندەکە تەنها پێنج پێشمەرگەی تێدا بوون سیانیان بریندار بوون‌و بۆ حەسانەوە لە گوندەکەدا بوون، بەڵام بەشێکی دانیشتووانی گوندەکە چەکدار بوون‌و زۆر جار وەك هێزی پشتگیری، بەشدارییان لە چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەدا دەکرد. هێرشەکانی دوژمن بۆ سەر گوندەکە هیچ ئامانجێکیان بەدەست نەهێنا، لە هەمان کاتیشدا بۆردمان کردنی ناو گوندەکە بەهاوەن هەر بەردەوام بوو، هەلیکۆپتەرەکانیش هەم ناو گوندەکەیان بۆردومان دەکردو هەم بەدەورووبەری گوندەکەدا دەسوورانەوە بۆ رێگرتن لە گەیشتنی کۆمەك بۆ گوندە ئابڵوقەدراوەکە.

سەعات ١٤ هێزێکی پێکهاتوو لە کەرتەکانی ١و ٢ تیپی ٥١ی گەرمیان‌و کەرتەکانی رێکخستنی کفری‌و دووز‌و هێزی پشتگیری فریای گوندەکە کەوتن‌و لە چەند قۆڵێکەوە هێرشیان کردە سەر هێزەکانی عێراق‌و لە ئاکامدا قەڵەمرەوی شەرەکە بەرینتر بوو. لەگەڵ دەستپێکردنی هێرشی هێزی پێشمەرگەدا، گۆرانێکی کتوپڕ بەسەر ئاووهەوادا هات‌و تەمومژێکی زۆر ناوچەکەی داپۆشی. لەم سۆنگەیە، هێزەکانی عێراق بەپەلەپروزێ خۆیان پێچایەوە لەمەیدانی شەر دوو شۆفڵ‌و تانکێکی بەرازیلیی تێکشکاوو چەند کامیۆنێکیان بەجێ هێشت.

لە کاتی کشانەوەی هێزەکانی دوژمندا، مەفرەزەیەکی کەرتی ٥ بەسەپەرشتیی حوسێن حەمە سەنمکە لەنێوان هەردوو گوندی ئۆمەرمل‌و فەتاح ئۆمەر بۆسەیان بۆ هێزەکان دانا، تەقەیان لە ئیڤاکان کردو زیانێکی زۆریان پێ گەیاندن.

هەر ئەو شەوە، هێزی پێشمەرگە لاشەی بەجێماوی سەربازەکانی برد بۆ گوندی سەید جەژنی کە ٢ کیلۆ مەتر لە ناحیەی سەرقەڵاوە دوورەو رادەستی موختاری گوندەکەی کرد تا بیداتەوە بەکاربەدەستانی سوپای عێراق لە سەر قەڵا. رۆژی دواتر، هەلیکۆپتەرە جەنگییەکانی عێراق کەوتنە بۆردومانکردنی گوندی عەزیز قادرو دەورووبەری کەبووە مایەی شەهیدبوونی هاوڵاتی هیدایت حاجی برایم.

لەم شەرەدا هێزی پێشمەرگە هیچ زیانی گیانیی نەبوو بەڵام لەناو گوندی توکندا هاوڵاتیەك شەهید بوو، پێشمەرگەیەکی هێزی پشتگیریش بریندار بوو.

توکن: گوندێکی سەر بەقەزای کفرییە، دەورووبەری ١٥ کیلۆ مەتر لەشاری کفرییەوە دوورە. لە شوێنێکی چاڵ دایەو لە شاڵاوی ئەنفالەکاندا وێران کراو دانیشتوانەکەی ئەنفال کران.

* چالاکی گوندی جەلالی:-

شەرێکە لە ١٥ی تەموزی ساڵی (١٩٨٥) لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزێکی سوپای عێراق کە لە فەوجێك‌و کەرتێکی جەیش شەعبی‌و جاشەکانی قادر کەرەم‌و دووز پێکهاتبوو‌و بەپاڵپشتی دوو هەلیکۆپتەر هێرشی بردبووە سەر گوندی جەلالی لەسەر رێگای گشتیی قادر کەرەم -دووز.

پێشمەرگەکانی تیپی ٥١ی گەرمیان‌و هێزی پشتگیری رووبەرووی هێزەکە بوونەوە، بەرپەرچی هێرشەکەیان دایەوەو زیانێکی زۆریان پێگەیاند. بەهۆی بۆردومانی هەلیکۆپتەرەکانەوە پێشمەرگە شوان حاجی عەزیز شەهید کراو دوو پێشمەرگەو سێ هاووڵاتیش بریندار بوون، سەرباری سووتانی دوو خانووی گوندەکە.

* چالاکی گوندی زەنان:-

شەرێکە بووەلەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزێکی سوپای عێراق لە ٣٠ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٥) لە گوندی زەنان لەنێوان چەمچەماڵ‌و سەنگاو. زانیارییەکانی هێزی پێشمەرگە ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد کە سوپای عێراق پلانێکی بۆ رووخاندنی گوندی زەنان هەیە. لەم سۆنگەیەوە پێشمەرگەکانی کەرتی ٣ی هەمەوەندی سەر بەتیپی ٥٧ی سەگرمە لە ٢٩ی تشرینی دووەم بۆ سەیان لە نزیك گوندی کونەکۆترو قەڵاچۆغە دانا. کاتێك کاروانێکی سەربازو جاش کەوتە بۆسەکەوە، پێشمەرگەکان کاروانەکەیان دایە بەر ئاگری چەکەکانیان‌و پاش شەرێکی دوو سەعاتی، ژمارەیەك سەربازو جاش کوژران‌و دوو ئۆتۆمبێلیش وەك دەستکەوت کەوتنە دەست هێزی پێشمەرگەوە. هێزی پێشمەرگە یەك شەهیدی هەبوو.

لە (٣٠)ی تشرینی دووەمدا هێزێکی بەربڵاوی سوپای عێراق بەپاڵپشتی جاش‌و بەپشتیوانیی ٦ هەلیکۆپتەری جەنگی‌و ٢ فرۆکەی هەنتەر هێرشیان کردە گوندی زەنان‌و شەرێکی سەخت لەنێوان هێزی پێشمەرگەو سوپای عێراق دامەزرا.

لەم سەروبەندەدا مەفرەزەیەکی کەرتەکە کە ئەو کاتە لە گوندی دێرەشە بوو، لە نزیك گوندی چراغە رووتە بۆسەیەکی بۆ جاشەکان نایەوەو دەستێکی کاریگەری لێوەشاندن. لەهەمان کاتدا پێشمەرگەکانی کەرتی ٥ی باسەرە بە فەرماندەیی قادر مەملی‌و هێزی پشتگیری‌و ئەو پێشمەرگانەی تازە لە دەشتی هەولێر گەرابوونەوە، فریای پێشمەرگەکان کەوتن‌و گوشاری هێرشی سوپای عێراقیان لەسەر کەمکردنەوە.

سەر لە ئێوارە، هێزەکانی سوپا بەزیانێکی زۆرەوە بەرەو چەمچەماڵ پاشەکشەیان کرد. پاش کشانەوەی هێزەکە، سوپا بەهاوەن کەوتە بۆردومان کردنی گوندەکە. لە ئاکامی ئەم شەرەدا، گوندەکە خاپوور بوو، زۆربەی هەرە زۆری خانووەکانی گریان تێبەر بوو.

دوژمن دەیان سەربازو جاشی لێ کوژراو ٧ کامیۆنی لێ تێکشا. ئۆتۆمبێلێکی لاندکرۆزەرو ٢ کلاشینکۆف‌و یەك دەمانچەو کۆمەڵێك تەقەمەنی، دەستکەوتی پێشمەرگە بوون. لە هێزی پێشمەرگە یەك شەهید هەبوو کە محەمەد حاجی عومەر چەشمە بەردینییە، لەگەڵ ٣ بریندار.

* چالاکی گوندی زینانە:-

شەرێکە لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزەکانی سوپای عێراق لە گوندی زینانە لە ١٠ی نیسانی ساڵی (١٩٨٥). لە مانگی نیساندا هەموو ئاماژەکان بەرەو ئەوە دەچوون کە هێزەکانی عێراق بەنیازی هێرشێکن بۆ سەر ناوچە رزگارکراوەکانی گەرمیان. رای زاڵ لەناو پێشمەرگە، زۆرتر

ئەوە بوو کە دەشێ هێرشەکە لە قۆڵی سەر قەڵا – ئۆمەربلەوە ئەنجام بدرێ، بۆیە هێزێکی تیپی ٥١ی گەرمیان لە گوندی بەلەگە دانراو هێزێکیش کە لە تیپی ٥١ ی گەرمیان و 57ی سەگرمە پێکهاتبوو، بۆ چاودێری کردنی قۆڵی نەوجول – دووزخورماتوو لە گوندی زێنانە دانرا،

لە ١٠ ی نیساندا هێزێکی سوپای عێراق بە فەرماندەیی جەنراڵ بارق عەبدوڵلا کە پێکهاتبوو لە هێزێکی بەربلاوی پیادەو ١٠ فەوجی جاشەکانی هەرکی و سوورچی و چەمچەماڵ و قادر کەرەم و دووزخورماتوو، بەپشتیوانیی ٤ هەلیکۆپتەری جەنگی و ٢ فرۆکەی پیلاتۆزو ١٠ تانك و یەکەی تۆپخانەو تۆپی ١٠٦ ملم و هاوەنی جۆراجۆر، لە قۆڵی نەوجول –دووزخورماتووەوە هێرشی کردە سەر ناوچەی داوودەو گەیشتە گوندی زێنانە. لەوێ دوو کەرتی تیپی ٥٧ی سەگرمەو دوو کەرتی تیپی ٥١ی گەرمیان رووبەرووی هێرشەکە بوونەوەو نەیانهێشت لەوە زیاتر پێشرەوی بکات. گوندەکە هەم درایە بەر تۆپ هەم هەلیکۆپتەرەکان لە ئاسمانەوە موشەکبارانیان دەکردو بەدۆشکا تەقەیان لێ دەکرد. لەناو گوندو دەورووبەری شەڕێکی دەستەویەخە روویدا.

پاش ئەوەی هێزەکانی پێشمەرگە لە گوندی بەلەگە دڵنیا بوون کە هێرش لە قوڵی سەرقەڵا – ئۆمەربلەوە ناکرێ، هێزێك لە پێشمەرگەکانی تیپی ٥١ی گەرمیان و تیپی ٥٣ی شێروانە و هێزی پشتگیری قۆڵەکەی بەجێهێشت و روویکردە زێنانە. ئەم فریاکەوتنە بەو سەرەنجامە گەیشت کە هێزەکانی دوژمن لەو قۆڵەوە لە هەندێ شوێن پاشەکشەیان پێ کرا.

شەر تا سەعات ٢٢ درێژەی کێشاو گوندەکە هەر بەدەست پێشمەرگەوە بوو، بەڵام مانەوە لەناو گوند هیچ سوودێکی نەمابوو، بۆیە هێزی پێشمەرگەو بەشێکی زۆری دانیشتوانی گوندەکە، وردە وردە پاشەکشەیان کرد، لە گوندەکە دەرچوون و لە گوندی زێنانەی ژووروو جێگیر بوون، بەڵام هێزێك بۆ قۆڵی عەزیز قادر – تۆکن نێردرا بۆ ئەوەی ئەگەر دوژمن پێشرەویی کرد لێی بدرێ.

بەیانییەکەی هێزەکانی عێراق چوونە ناو زێنانەو هەموو ئەو دانیشتوانەیان دەستگیر کرد کە نەچووبوونە دەرێ و پاش چەند مانگێك ئینجا ئازادیان کردن.

زیانی هێزەکانی عێراق لەم شەرە بە ٤٠٠ کوژراو و ژمارەیەکی زۆری بریندار مەزندە دەکرێ. لەم شەرەدا ٤ پێشمەرگەو یەك پێشمەرگەی هێزی پشتگیری ویەك هاووڵاتی شەهید بوون و گوندەکە زیانێکی گەورەی بەر کەوت.

*** چالاکی سەنگاو – چەمچەماڵ:-**

چالاکییەکی هێزی پێشمەرگەیە لەسەر رێگای سەنگاو – چەمچەماڵ لە ئێوارەی رۆژی ٣٠ی ئابی ساڵی (١٩٨٥) کە تێیدا کۆمەڵێك جاش کوژران. هێزێکی هاوبەشی هەردوو تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون و ٥٧ی سەگرمە بۆ سەی لەسەر رێگای سەنگاو – چەمچەماڵ بۆ ئەو جاشانە دانا کە رۆژانە لەسەر رێگاکە بۆ سەیان بۆ پێشمەرگە دادەنا.

جاشەکان کەوتنە بۆسەکەوەو درانە بەر گوللەو دەستبەجێ ١١ کەسیان کوژرا. ئەوانی تر سەریان لێ شێواو بۆ خۆرزگارکردن بەرەو رەبییەکانی دەورووبەر رایانکرد، لەم سەروبەندەدا بەشێکیان ئەو مینانەیان پێدا تەقییەوە کەسەربازەکان لە دەورووبەری رەبییەکان چاندبوویان.

لاشەی هەشت جاش کەوتە بەر دەستی پێشمەرگە لەوانە لاشەی فەرماندەی جاشەکان رەشید مەجید هاوار، جاشێکیش بەدیل گیرا. هێزی پێشمەرگە دەستی بەسەر ٨ پارچە چەك و هەندێ تەقەمەنیدا گرت.

*** چالاکی شاری کەرکوك:-**

چالاکییەکە سێ پێشمەرگەی ناوشاری رێکخستنەکانی کەرکوکی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان لەناو شاری کەرکوك ئەنجامیان داوە. ئامانجی چالاکییەکە پاکتاوکردنی دوو ئەفسەری هێزی ئاسمانیی عێراق بوو. بەپێی نەخشەکە وا دانرابوو کە چالاکییەکە بەماتۆرسیکل ئەنجام بدرێ. کارەکان وا دابەش کران کە دوو پێشمەرگە ئەرکی جێبەجێ کردن بگرنە ئەستۆ، یەکێکیان ماتۆرسیکلەکە لێخوڕێ و ئەوی تر نارنجۆك فرێ بداتە ناو ئۆتۆمبێلی دوو ئەفسەرەکە. پێشمەرگەکەی تریش بە سواری لاندکروزێك لەدەرەوە چاودێریی چالاکییەکە بکاو ئەگەر دوو پێشمەگەکە گیران یان کوژران، هەواڵەکە بباتەوە بۆ رێکخستن یاخود لەکاتی لێقەوماندا فریایان بکەوێ و بە ئۆتۆمبیلەکەی لە شوێنی چالاکییەکە دووریان بخەتەوە.

بەم پێیە لەنێوان سەعات ١٣،٣٠ – ١٤ لەسەر رێگای هاتوچۆی فرۆکەوانەکانی هێزی ئاسمانی عێراق، لەنزیك وێستگەی نەوتی کەی وەن ماتۆرسیکلەکە چووە ئاستی ئۆتۆمبیلی دوو ئەفسەرەکەو یەکێ لە پێشمەرگەکان دوو نارنجۆکی فرێدایە ناو ئۆتۆمبیلەکە، نارنجۆکەکان تەقینەوەو ئۆتۆمبیلەکە ئاگری تێ بەربوو، لەئاکامدا هەردوو ئەفسەری فرۆکەوان کەیەکێکیان بەپلەی رائیدو ئەوی تر بەپلەی مولازمی یەکەم بوو، گیانیان لەدەستدا.

پەیامی چالاکییەکە ئەوە بوو کەتێکۆشەرانی کورد لەتاوانەکانی هێزی ئاسمانیی عێراق بێدەنگ نابن. لەپاش ئۆپەراسیونی لێدانی دام و دەزگا نەوتییەکانی عێراق لەبابا گورگوڕو چەمەبۆڕو جەوەڵ بۆر لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨٦)، عێراق زۆر بەچڕی دەستی دابووە بەکارهێنانی هێزی ئاسمانی لە دژی مەدەنییەکان و بارەگاکانی هێزی پێشمەرگە.

لەماوەی نێوان ١١و ١٧ی تشرینی یەکەمدا عێراق لانی کەم هەشت جار هێزی ئاسمانیی بەمەبەستی گەیاندنی زۆرترین زیان بەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگە بەکار هێنا بووولەم سەروبەندەدا هەلیکۆپتەری جەنگی و پیلاتۆزو سیخۆی بەچڕی بەکار هێنا بوو.

لە ١١ی تشرینی یەکەمدا، تەنها یەك رۆژ پاش ئۆپەراسیونەکەی کەرکوك، هەلیکۆپتەری جەنگی کەوتە بۆردومان کردنی گوندەکانی دەورووبەری شاری کەرکوك. لەناوچەی شوان هەلیکۆپتەر گوندەکانی پەلکانە، شەوگێر، کاوڵەسوار، شەیتان، کارێزو مەزیخەی خوارووی بۆردومان

کرد، لەئاکامدا دوو هاووڵاتی کوژران‌و هاووڵاتییەکیش بریندار بوو.
لەناوچەی کۆیە هەلیکۆپتەر هەردوو گوندی گۆمەشین‌و قزلووی بۆردومان کرد، لەئەنجامدا دوو ئافرەت‌و منداڵێکی سێ ساڵان کوژران‌و چەند هاووڵاتییەکیش بریندار بوون.
لەناوچەی ئاغجەلەر هەلیکۆپتەر گوندەکانی کانی هەنجیرو شێخان‌و مۆردخواردەی خواروی بۆردومان کرد، لەئەنجامدا بۆردومانەکە بووە هۆی برینداربوونی هاووڵاتییەك‌و منداڵێك. لەناوچەی سووررداش هەلیکۆپتەر گوندەکانی سوورقاوشان‌و زیرلین‌و درەناسیی بۆردومان کردو بەهۆی ئەم بۆردومانەوە زیانێکی زۆر بەر گوندەکان کەوت.
لەسنووری هەڵسوورانی تیپی ٥٧ی سەگرمە هەلیکۆپتەر کەوتە بۆردومان کردنی گوندەکانی مێولی، شێخ جیری، کۆریاس، جانی، تەکیە، وەستا خدر، حەفتا چەشمە، هۆمەرگاوا، تیمزاوەو قایتەوەن. لەئاکامدا بیست هاووڵاتی بریندار بوون‌و زیانێکی زۆر بەر گوندەکان کەوت.
لە ١٥ی تشرینی یەکەمدا چوار فرۆکەی پیلاتۆز دوو جار لە ڕۆژێکدا کەوتنە بۆردومان کردنی هەردوو گوندی تیلیان‌و فەقێ میرزا لە دەوروبەری شاری کەرکوك. جاری یەکەم لە سەعات ٢ی پاش نیوەڕۆو جاری دووەم لە سەعات دووو نیو. هەردوو بۆردومانەکە لە گوندی تیلیان برینداربوونی ٣ی هاووڵاتی‌و لە گوندی فەقێ میرزا برینداربوونی ٨ هاووڵاتییان لێکەوتەوە، سەرباری زیانێکی مادديی زۆر. بۆ ڕۆژی دواتر، دیسان فرۆکەکان هەردوو گوندیان بۆردومان کرد، لە ئەنجامدا هاووڵاتییەك کوژراو زیانێکی مادديی زۆر بەر جوتیارەکان کەوت.
لە ١٦ی تشرینی یەکەمدا چەند فرۆکەیەکی پیلاتۆز گوندەکانی دۆڵی سماقولیی پارێزگای هەولێریان بۆردومان کرد. هەر ئەو ڕۆژە لەناوچەی کۆیە بەتۆپی دوورهاوێژ گوندی باغە خدر ژێر تۆپباران کرا، لە ئەنجامدا ٩ هاووڵاتی بریندار بوون، لەوانە چواریان ژن بوون.
لە ١٧ی تشرینی یەکەمدا چوار فرۆکەی سیخۆری کەوتنە بۆردومان کردنی گوندی سماقولی‌و بۆردومانەکە هیچ زیانێکی گیانیی لێ نەکەوتەوە. ئەم هەموو بۆردومان کردنە هاندەر بوون بۆ بیرکردنەوە لەدەستوەشاندن لە ئەفسەرە فرۆکەوانەکانی هێزی ئاسمانیی عێراق لەناو شاری کەرکوك‌و لە سایەی ئەم هەلومەرجەدا چالاکییەکەی ٢٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨٦)ی کەرکوك ئەنجام درا.

* ئۆپەراسیۆنی کەرکوك:-

ئۆپەراسیۆنی موشەکباران کردنی دامەزراوە نەوتییەکانی کەرکوك لە شەوی ١١ لەسەر ١٢ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨٦). ئەم ئۆپەراسیۆنە زادەی هاوکاریی نێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان وئەو باڵەی ناو حکومەتی ئێران‌و سوپای پاسدارانی ئێران بوو کە دژی راگرتنی شەڕ بوو دژی عێراق‌و دەیویست تا ڕوخاندنی ڕژێمی سەددام درێژە بە شەڕ بدا. باڵەکە گوشارێکی زۆری بۆ ڕاگرتنی شەڕ لەسەر بوو، بۆیە بەدوای هاوپەیمانیی تازەدا دەگەڕاو دەیویست بۆ شەقام‌و ڕکابەرە سیاسییەکانی بسەلمێنێ کە لەتوانایدایە درێژە بە شەڕ بداو سەرکەوتوش بێ تێیدا.
ئێرانییەکان بیریان لەلێدانی دامەزراوە نەوتییەکانی کەرکوك دەکردەوە، بەڵام کێشەکەیان لەوەدا بوو کە لەخۆیان ڕانەدەبینی بتوانن بگەنە نزیك دامەزراوە نەوتییەکان. ساڵی (١٩٨٦) ئێرانییەکان ئامادەیی یارمەتیدانی هێزی پێشمەرگەیان بۆ لێدانی دامەزراوە نەوتییەکانی کەرکوك نیشاندا. کێشەی هێزی پێشمەرگە لەوەدا بوو کە دەیتوانی بگاتە دامەزراوە نەوتییەکان، بەڵام چەکی پێویستی بۆ وێران کردنی دامەزراوەکان نەبوو. بۆیە ئامادەیی ئێرانییەکان بۆ یارمەتیدانی هێزی پێشمەرگە ئەم کێشەیەی چارەسەر دەکرد.
بۆ ئەنجامدانی ئەم چالاکییە، هێزی پێشمەرگە نزیکەی پەنجا تۆن چەکی لە ئێرانییەکان وەرگرت، لەوانە هاوەن‌و کاتیۆشاو موشەکی سام ٧ی دژی فرۆکەو لە سێ قۆڵەوە ئەو چەکانەی گەیاندە نزیك ئامانجە دیاریکراوەکان.
نەوشیروان مستەفا، جێگری سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان سەرپەرشتیی ئۆپەراسیۆنەکەی کردو خۆیشی سەرکردایەتیی ئەو قۆڵەی کرد کە لە گوندی مۆردخواردەی سەرووەوە لە نزیك خاڵخاڵان، دامەزراوە نەوتییەکانی بابا گورگوری بۆردومان کرد. قۆڵی دووەم بە ئازاد حەمە غەریب سپێردرا کە لە گوندی کەواڵەوە دامەزراوە نەوتییەکانی جەوەڵبۆری موشەکباران کرد. قۆڵی سێیەم بە مەحمود سەنگاوی سپێردرا کە لە گوندی تۆپخانەوە دامەزراوە نەوتییەکانی چەمەبۆری موشەکباران کرد.
دەوروبەری ١٥٠ پاسداری ئێرانی بەشدار بوون لە ئۆپەراسیۆنەکەدا کە زۆربەیان تەکنیککار بوون. هاوکات، لەگەڵ موشەکباران کردنی دامەزراوە نەوتییەکاندا، هێزی پێشمەرگە هێرشی کردە سەر چەند پێگەیەکی سەبازی‌و نەوتی.
ئۆپەراسیۆنەکە لە هەموو جیهان دەنگی دایەوەو سەرەڕای ئەوەی کە بەکردەوە ئۆپەراسیۆنێکی سوپایی بوو، بەڵام پەیامێکی سیاسیی گەورەی پێ بوو. بەهۆی ئەم ئۆپەراسیۆنەوە باڵی خوازیاری درێژەپێدانی شەڕ لە ئێران باڵادەستیی بەدەست هێناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیش ئەو پەیامەی بە گوێی ڕژێمی سەددام دا کە هێزی پێشمەرگە دەتوانێ بگاتە شوێنە ستراتیجییەکان‌و گورزی کاریگەرییان لێ بووەشێنێ.
ئەم ئۆپەراسیۆنە ڕێی بۆ ئەوە خۆش کرد کە ئێران پشتگیریی پرۆسەی ئاشتبوونەوەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان‌و پارتی دیموکراتی کوردستان بکا. لەم سەروبەندەشدا ڕێککەوتنێك لەنێوان ئێران‌و یەکێتی بۆ هاوکاری کردنی یەکتری ئیمزا کرا کە سەرەتای یەکخستنی هەوڵەکانیان بوو بۆ جێبەجێ کردنی تیۆریی کۆتایی هێنان بە جەنگ لە ڕێ ڕووخاندنی ڕژێمی سەددامەوە.
(پاشکۆی ژمارەیەك)
بروسکەی سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان بۆ نەوشیروان مستەفاو فەرماندەکانی بەشدار لە

ئۆپەراسیۆنی کەرکوك.

لەمام جەلالەوە بۆ: هەڤاڵی تێکۆشەرو هێژا فەرماندەی داستانی کەرکوك.

هەڤاڵی تێکۆشەر فەرماندەی مەڵبەندی یەکی قارەمان.

هەڤاڵی تێکۆشەر فەرماندەی مەڵبەندی دووی قارەمان.

هەڤاڵی تێکۆشەر فەرماندەی مەڵبەندی چواری قارەمان.

بەسلاوێکی شۆڕشگێرانەی گەرمەوە پیرۆزبایی سەرکەوتنی نەخشەی یەکێتیتان لێ دەکەم کە داستانی کەرکوکی لە مێژووی شۆڕش‌و گەلەکەماندا تۆمار کرد. سوپاسی خۆتان‌و هەموو لێپرسراوەکانی پێشمەرگەو هەموو سەرتیپەکان‌و فەرماندەی کەرتەکان‌و پێشمەرگەکانی بەشداربوو لەو هەڵمەتە مێژووییەدا دەکەم. ئەنجامدانی سەرکەوتووانەی نەخشەی یەکێتی بەهاوبەشیی خۆتان‌و پتر لە سێ هەزار پێشمەرگەی کوردستان‌و یارمەتیدانی تەکنیکی‌و چەك‌و تەقەمەنیی دۆستانی کۆماری ئیسلامی، کارێکە کەم نییە لە مێژووی شۆڕش‌وکوردواریدا، کە لە تێکشکاندنی هێرشەکانی عەفلەقییە فاشییەکان بۆ سەر کوردستان‌وپەکخستنی قادسییە شومەکایاندا دەورێکی گرنگ‌و گەورەی دەبێت. ئەم کارە مێژووییە بێ وێنەو بێ هاوتایە لە مێژووی کوردستان‌و شۆڕشی کوردستاندا. توانای زۆرو زەوەندی هێرشی پێشمەرگەی کوردستانی بەرێبەریی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆ دۆست‌و دوژمن دەرخستەوە.

ئەو راستییەشی دەرخستەوە کە هێشتا دەستی کورد دەگاتە نەوتە بەتاڵان براوەکە کوردستان، هەروەك گورزێکی کاریگەریشی لەنەخشەی گڵاو وسیاسەتی ئیستعماری ئیستیتانیی عەفلەقی داوە، بەوەی کە دەرامەتەکەیان کەمدەکاتەوە، ئەو دەرامەتەی کە لەکرینی چەك‌و تەقەمەنی‌و تانك‌وتۆپ بۆ وێران کردنی کوردستان‌و فریودان‌و کرینی جاشەکان سەرف دەکرێت. هەر بۆیەش ئەم کارە مێژووییینە هەتا هەتایە لە مێژووی کوردایەتی‌و شۆڕشدا هەر دەدرەوشێتەوە.

بەراستی هیچ زمان‌و ڕستەیەك توانای ئەوەی نییە نرخ‌و ئەهەمیەتی ئەم کارە دەربڕێت. بۆیە هەر ئەوەندە دەڵێم کە هەروەك چۆن پێکهاتن‌و گەشەکردنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان‌و شۆڕشەکەمان لە دوای ئاشبەتاڵ موعجیزەیەکی سیاسی و پێشمەرگانە بوو، ئەوهاش ئەم هێرش و هەڵکوتانەی ئێوە بۆ سەر کەرکوك‌و جەوەڵ بۆرو زەمبور، موعجیزەیەکی جەنگیی شۆڕشەکەی کوردستانە، موعجیزەیەکی جەنگی گەلە.

بێگومان گەلەکەمان‌و شۆڕشەکەمان‌و یەکێتییە نیشتمانییە کوردستانەکەمانیش لە جاران پتر دڵنیان لەسەرکەوتن چوونکە بوونی ڕۆڵەی وەکو ئێوەو هێزی پێشمەرگەی کوردستانی ئا ئەوها قارەمان‌و دلێر هەر نیشانەی سەرکەوتن‌و دەستەبەری پێشکەوتن دەبن.

دووبارە پیرۆزبایییەکی گەرم‌و سلاوی شۆڕشگێرانەو سوپاسی بێ پایان‌و هەر شادو سەربەرزو سەرکەوتوو بن.

(پاشکۆی ژمارە ٢)

بروسکەی نەوشیروان مستەفا بۆ تاڵەبانی‌و مەکتەبی سیاسی.

پیرۆزبایی لە جەنابتان‌و گەلەکەمان دەکەم کە لە شەوی ١٠ لەسەر ١١ی تشرینی یەکەمی (١٩٨٦)دا تۆپخانەی قورسی شۆڕش‌و کاتیۆشا تۆپبارانی بیرە نەوتەکانی بابەگورگوری کرد. هێزی پێشمەرگەی قارەمانی مەڵبەندی ٢ی مەڵبەندی ٤ لە هێرشێکی کتوپڕدا هەموو ڕەبییەکانی سەرکەلی سێکانیانی گرت کە دەکەونە سەر زنجیرە شاخی کانی دومەڵان‌و دەڕوانێ بەسەر داوودەزگا پترۆڵییەکانی کەرکوکدا.

لەم هێرشەدا هەموو داوودەزگا گرنگەکانی کەرکوك خاپور کران‌و تا ئێستاش هەر دەسوتێن. هاوزەمان لەگەڵ ئەم سەرکەوتنە گەورەیەشدا قاعیدەی سەربازیی دارەمان‌و وێستگەی تەقویەی تەلەفزیۆنی تەئمیم‌و وێستگەی تەشویش لە سەقزلی‌و حەسارو بارەگای فەیلەقی سوپاو بارەگای فرقەی ٢و فرۆکەخانەی هەلیکۆپتەرو قاعیدەی ئاسمانیی کەرکوك‌و چەندین شوێنی جاسوسیی گرنگ بەخەستی تۆپ‌و گوللەباران کران.

ئەوەی شیاوی باسە، قورسایی گوللەبانی بۆ ئەم شوێنانە دانرابوون لە ٣٠ تەن زیاتر بووەو هەموو ئەم کارانەش لە ماوەی یەك سەعات جێبەجێ کران. هاوزەمان لەگەڵ ئەم سەرکەوتنە گەورەیەشدا مەڵبەندی یەکی تێکۆشەر چاڵە نەوتەکانی زەمبورو جەوەڵ بۆری خاپور کرد. پێشمەرگەکانی مەڵبەندی ٤ی قارەمانیش جگە لە بەشدارییەکانیان لە تێکدانی بابە گورگور، لە چەندین شاری سنووری مەڵبەندەکەی خۆیان داوە.

( پاشکۆی ژمارە ٣)

ڕاگەیاندنی دەزگای پێشمەرگایەتی دەربارەی ئۆپەراسیۆنی کەرکوك.

ماوەی یانزە ساڵە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە پشت بەستن بەجەماوەرو توانای تێکۆشەرە کۆڵنەدەرەکانییەوە لە خەباتێکی سەخت‌و دژواری بێ وچان دایە لە دژی عەفلەقییەکان کە بەئاگرو ئاسان خۆیان بەسەر جەماوەردا سەپاندووەو مافە دیموکراتییەکانی گەلانی عێراق‌و مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد پێشێل دەکەن.

بۆیە ئەمڕۆ بەمەبەستی تووندوتیژکردنی خەبات‌و گورزی کاریگەرتر وەشاندن لە ڕژێم‌و بۆ زەمینە خۆش کردنی ڕوخاندنی، ناچار بووین یارمەتیی بێ قەیدو شەرت لە حکومەتی ئێران وەربگرین بۆ لێدانی دامەزراوە نەوتییەکانی کەرکوك کە بوونەتە سەرچاوەیەکی مانەوەو بەردەوامیی ڕژێم، بەڵام دوای ئەوەی بەڵێنی تەواویان دا کە چاویان لە عێراق نیەو نایانەوێ شێوەی ڕژێمی داهاتوش بەسەر جەماوەردا بسەپێنن.

لە شەوی ١٠ لەسەر ١١ی تشرینی یەکەمدا هێزێکی هاوبەش لە پێشمەرگە قارەمانەکانی مەڵبەندی ٢و بەپشتیوانیی مەڵبەندی ٤،١ کە خۆی لە نزیکەی ٣٠٠٠ پێشمەرگە دەدا، بەیارمەتیی چەك‌و پسپۆڕو شارەزایانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە چەندین قۆڵەوە پەلاماری بیرە نەوتەکانی بابە

گورگورو زەمبورو جەوەل بۆریان داو ٤٠ تەن گوللە تۆپیان بەسەردا باراندن. هەروەها چەندین شوێنی تری سوپای عێراقیان خاپور کرد کە زەرەرو زیانێکی گەورەی بە دوژمن گەیاند.

(پاشکۆی ژمارە ٤)

بروسکەی مەلبەندی یەك بۆ نەوشیروان مستەفا بەپێی نەخشەی دیاریکراوی بەرێزتان هێزە هاوبەشەکانی مەلبەندی یەك لە سەعات ١٢،٣٠ ی شەوی ١١ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨٦) بە تۆپی قورس و کاتیۆشا لە دوو قۆڵەوە بۆ ماوەی دوو سەعات تۆپبارانی چاڵە نەوتەکانی جەوەل بۆرو زەمبوریان کردو هێرشیان کردە سەر بنکە سەربازی و رەبییەکانی دەورووپشتی. گوللە تۆپەکان شوێن مەبەستەکەیان بەچاکی پێکاو ئاگریان بەردایە هەموو دامەزراوو چاڵە نەوت و سەربازگەکان بەشێوەیەك کە دەنگی تەقینەوەی گوللە تۆپ و ئاگرەکان هەموو ناوچەکەیان رۆشن کردبۆوە. لەم تۆپ بارانەدا زیاتر لە قورسایی ١٠ تەن ئاسن و باروت بەسەر بیرە نەوتەکاندا بارێنرا.

### * چالاکی گوندی حاجی جەرجیس

چالاکیی پێشمەرگەکانی کەرتی تیپی ٢١ی کەرکوك و کەرتی ٢ی شوان لە ٣١ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٦) لەسەر رێگای نێوان تەقتەق و شوان.

بەپێی نەخشەکە، بۆسە لەسەر رێگاکە دانراو رۆژێکی تەمومژاوی و هەوری بۆ ئەنجامدانی چالاکییەکە هەڵبژێردرا بۆ کەمکردنەوەی کاریگەریی بەکارهێنانی هەلیکۆپتەر لە دژی پێشمەرگە. بۆسەکە لە نزیك گوندی حاجی جەرجیس دانراو هێزێکی تر لە نێوان هەردوو گوندی سوورکەل و جانقز بۆسەیەکی تری دانا بۆ لێدانی هەر هێزێکی سەربازگەی سەقزلی کە بییەوێ بە هانای هێزە لێدراوەکەوە بچێت.

سەعات ٢٠، ١٦ سێ ئیڤای پڕ کۆماندۆو دوو ئۆتۆمبیلی هینۆی پڕ چەکداری جەیش شەعبی کەوتنە بۆسەکەوەو درانە بەر گوللە. بۆسەکە کوژرانی زیاتر لە ٣٠ سەربازو بەدیل گرتنی ١٩ سەربازو چەکداری جەیش شەعبی و تێکشکانی ٣ ئیڤاو دوو هینۆی لێکەوتەوە، سەرباری ئەوەی کە هێزی پێشمەرگە ٢٦ پارچە چەکی چنگ کەوت. لە هەمان کاتدا هێزێکی تری سەربازو جاش کە دەیویست فریای هێزە لێدراوەکە بکەوێت، کەوتە بۆسەکەی نێوان سوورکەل و جانقزو لەوێش دوژمن چەند کوژراوو بریندارێکی لێکەوت و زرێپۆشێکی لێ تێك شکێنرا.

لە دابەشکردنی کارەکانی چالاکییەدا قۆڵی بۆسەکەی حاجی جەرجیس، سەرباز حوسێن فەرماندەی کەرتی ٢ی شوانی سەر بەتیپی ٢١ی کەرکوك هەڵی سووراندووەو قۆڵی بۆسەکەی نێوان سوورکەل و جانقز، مام برایمە سوور فەرماندەی کەرتی تیپی ٢١ی کەرکوك بەرێوەی بردووە. هێزی پێشمەرگە یەك شەهیدی بەناوی سامان رەجەب گۆگجەیی هەبوو.

ناوی بەشێك لەو پێشمەرگانەی لەم چالاکییەدا بەشدار بوون: محەمەد رەفیق ناسراو بە نەهرۆ حەساری، سەرتیپ حەساری، ئازاد گورگەیی، ئازاد چەلتووکەیی، خالید حەمە عەلی، عومەر رەسول، وریا کەریم رۆژبەیانی، خالید عارف ناسراو بەراپەر، عەبدولرەحمان سادق سلێمان، شاخەوان سەعید، ناسیح وادی بەکر، بەختیار کەرکوکی، بابە عارف، سەردار رەزا، برایم فازڵ ناسراو بەئیبا، تاریق گۆگجەیی، ئازاد دەلۆیی، هەڵگورد کەلهوری، هەڵکەوت عەبدوڵڵا، فەیسەڵ حوسێن، عەونی محێدین، سەباح رەسوڵ مەردان ئیسکانی، عەزیز عادل عەرەب و رۆستەم حەمە بۆر.

### * ئۆپەراسیۆنی ناحیەی قادر کەرەم:-

ئۆپەراسیۆنی گرتنی شارۆچکەی قادر کەرەم لە ساڵی (١٩٨٦) لەلایەن تیپەکانی مەلبەندی یەکەوە. لە ١٩ ی ئەیلولدا، لەکاتێکدا کە بەشێکی زۆری هێزی تیپەکانی گەرمیان سەرقاڵی ئۆپەراسیۆنی قەیوان - ماوەت بوون، ئەو هێزانەی لەناوچەکە مابوونەوە، کەوتنە جێبەجێ کردنی نەخشەی گرتنی قادر کەرەم. تیپە بەشدارەکان بریتی بوون لە ٥١ی گەرمیان، ٥٣ی شێروانە، ٥٥ی قەرەداغ، ٥٧ی سەگرمەو تیپی مەلبەندی یەك.

بەپێی نەخشەکە، هێزی راسپێردراو لەگەڵ خۆرئاوابووندا لە گوندی قەیتولەوە بەرەو پردی قەڵای مکائیل بەرێکەوت و لە نزیك پردەکە دەستەی سەرپەرشتیاری ئۆپەراسیۆنەکە کە بریتی بوون لەبەرپرسانی کاروباری پێشمەرگایەتی، هەر یەك لە شەوکەوت حاجی موشیر، حەسەن حەمید (رۆستەم)، ئاوات قارەمانی و فەرماندەی تیپەکانی ٥٧ی سەگرمە مەحمود سەنگاوی و ٥١ی گەرمیان محەمەد حاجی شێخ کەریم (حەمە رەش) دوایین کۆبوونەوەی پێش دەستپێکردنی ئۆپەراسیونەکەیان کردو دوا بریاریان سەبارەت بەهەندێ وردەکاری دا. بەپێی نەخشەکە، هێزەکان کران بەچوار بەشەوە. بەشی یەکەم لەچەند قۆڵێکەوە چووە ناو قادر کەرەوم، بەشی دووەم بۆ هێرش کردنە سەر سەربازگەی باسکە درێژ دانرا، بەشی سێیەم بۆ گرتنی رەبایەکان تەرخان کراو بەشی چوارەمی هێزەکە راسپێردرا بۆسە لەسەر هەموو ئەو رێگا سەرەکییانە دابنێ، کەدەشێ هێزی سوپای بۆ ناو قادر کەرەم پێدا تیپەرێ.

لەماوەی سەعاتێکدا زۆربەی ناوشار کۆنترۆڵ کراو دەست بەسەر هەموو رەبایەکان و سەربازگەکەدا گیرا. ئۆپەراسیۆنەکە دوو شەهیدی لێکەوتەوە کە بریتی بوون لە جەمال مۆرتکەیی لە تیپی ٥٥ی قەرەداغ و مەحمود سەرقەڵایی سەردەستەی مەفرەزەکەی مەحمود سەنگاوی. دەستکەوتێکی زۆری چەك و تەقەمەنی کەوتە دەست پێشمەرگەو ئۆپەراسیونەکە دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو.

هەر ئەو شەوە هێزی پێشمەرگە شارۆچکەکەی بەجێ هێشت و گەرایەوە بنکەکانی خۆی. بەیانییەکەی، هێزێکی زۆری سوپای عێراق بۆ قادر کەرەم نێردرا. ئەو هێزە کەوتە گرتنی ژمارەیەك هاووڵاتی، لەوانە بەشێکیان گوللەباران کران.

*** چالاکی گوندی ساتی:-**

شەرێکە لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزێکی بەربڵاوی سوپای عێراق‌و جاشەکان لە ۳۰ ی ئابی ساڵی (۱۹۸٦) لە گوندی ساتی لە ناوچەی شوان. هێزێکی گەورە کە پێکهاتبوو لە فەوجێك کۆماندۆو چەند هەزار جاشێك، بەپاڵپشتی ٤ تانك‌و زرێپوش‌و دوو کاتیۆشاو ٤ تۆپی ۱۰٦ ملم بە فەرماندەیی فەرماندەی لیوای چەمچەماڵ. لە قەرەهەنجیرەوە هێرشی کردە سەر گوندی گورگەیی ولە وێوە رووی کردە گوندی ساتی.

پێشمەرگەکانی کەرتی ۳ی تیپی ۲۱ی کەرکوك بەفەرماندەیی شاهۆ کەرکوکی لەو کاتەدا لەناو گوندی ساتی بوون. بەر لەوەی هێزەکەی دوژمن بگاتە گوندەکە، بەشێکی کەرتەکە لە نزیك پردی سەر رێگای ساتی بۆ سەی دانا. دە ئۆتۆمبێلی پڕ جاش کەوتنە بۆسەکەوە. پێشمەرگەکان لێیانداو شەڕ بەگەرمی دەستی پێکرد. جاشەکان کوژراوو برینداریێکی زۆریان کەوت‌و زۆری نەبرد کشانەوە بەرەو گورگەیی، یەك ئۆتۆمبێلیان بەسوتاوی‌و ٦ی تریش لە مەیدانی شەڕ لێ بەجێما.

پاش کشانەوەی جاشەکان، ۳ هەلیکۆپتەری جەنگی دەستیان بەبۆردومان کردنی پێشمەرگە کردو لەهەمان کاتدا هێزەکانی سوپا بەکاتیۆشاو هاوەن کەوتنە تۆپباران کردنی شوێنی پێشمەرگەکان. دوا بەدوای تۆپباران، هێزەکانی کۆماندۆو جاش دەستیان بەهێرشکردن بۆ سەر گوندەکە کرد.

لەو کاتەدا مەفرەزەیەکی کەرتی ۲ی شوانی سەر بەهەمان تیپ بەسەرپەرشتی عەلی شوانی بۆ هاوکاری کردنی پێشمەرگەکانی کەرتی ۳، لە گوندی گۆرانەوە خۆی گەیاندە گوندی ساتی.

یەکەم هێرشی کۆماندۆ بۆ سەر گوندەکە، زۆر توند بەرپەرچ درایەوەو دوژمن ژمارەیەکی زۆر کوژراوی لێکەوت. لەهەمان کاتدا هێزێکی تری دوژمن لەنێوان گوندی ساتی‌و گۆران دزەی کرد بەو مەبەستەی کە پشت لە پێشمەرگەکان بگرێ، بەڵام پێشمەرگەکانی کەرتی ۲ی شوان بەرپەرچیان دانەوەو زۆریان لێ کوشتن. لە سەعات ۱۲وە تا ١٤ هەموو هێرشەکانی دوژمن تێکشکێنران. دوای سەعات ١٤ هێزەکانی سوپای عێراق دەستیان بەپاشەکشە کرد. بەڵام لەهەمان کاتدا بەهەلیکۆپتەرو کاتیۆشاو هاوەن دەست بە بۆردومان کردنی گوندەکە کرا.

دوژمن زیانێکی زۆری لێکەوت کە بە ۷۰ کوژراوو ژمارەیەکی زۆری بریندار مەزەندە دەکرێ، سەرباری تێکشکانی ۱۰ ئۆتۆمبێل. هێزی پێشمەرگە ٦ شەهیدی هەبوو کە بریتین لە جەمال ئەنوەر عەبدولعەزیز جێگری فەرماندەی کەرتی ۲ی شوان، عەلی شوانی فەرماندەی مەفرەزە لە کەرتی ۲ی شوان، پشکۆو تاریق گۆگچەیی لە کەرتی ۲ی شوان، سمایل مەجیدو بەختیار چیمەنی لە کەرتی ۳ی شەهیدانی چیمەن.

*** چالاکی گوندی جەوەل بۆر:-**

ئۆپەراسیۆنێکە هەردوو تیپی ٥۱ی گەرمیان‌و ٥۷ی سەگرمە لەشەوی ۱۱ لەسەر ۱۲ی تشرینی دووەمی ساڵی (۱۹۸٦) لە جەوەل بۆر ئەنجامیان داوە.

لەم ئۆپەراسیۆنەدا پێشمەرگە لەو رەبیانەی دا کە سوپای عێراق بۆ پاراستنی دام‌و دەزگا نەوتییەکانی جەوەل بۆر دایناوبوون، هێزی پێشمەرگە، پەلاماری چوار رەبییەی داولە ماوەیەکی زۆر کەمدا دەستی بەسەردا گرت‌و پاشان سووتاندی.

لەم ئۆپەراسیۆنە دوژمن ۳٦ سەربازی کوژراوی هەبوو، ۹ سەربازیشی بەدیل لێ گیرا، پێشمەرگە زیانی نەبوو.

*** ئۆپەراسیۆنی ناوچەی چەمچەماڵ:-**

ئۆپەراسیۆنێکە کەرتی ۲ی شوانی سەر بە تیپی ۲۱ی کەرکوك بۆ وێرانکردنی کارگەی قیری چەمچەماڵ‌و گرتنی رەبییەکانی پاراستنی کارگەکە ئەنجامی داوە. بۆچوونی داڕێژەرانی نەخشەکە ئەوە بوو کە گرتنی رەبییەکان‌و کارگەکە ئاسانە، بەڵام پاشەکشەکردن لە شوێنی چالاکییەکە دژوارە، بەتایبەتی کەنێوانی کارگەکەو بارەگای لیوای ناوچەکە تەنها یەك کیلۆ مەتر بووە. پاش تاوتوێ کردنی هەموو لایەنەکانی مەسەلەکە، بریار درا چالاکییەکە لە ٥ی نیسانی سالس (۱۹۸٦)دا ئەنجام بدرێ.

بەپێی نەخشەکە، هێزی ئەنجامدەری چالاکییەکە بەسەر ٤ گرووپدا دابەش کرا: گرووپێك بەسەرپەرشتیی سابیر رەوەند بۆ هێرش کردنە سەر رەبییەی پاراستنی کارگەکە، گرووپێك لە ۳٥ پێشمەرگەی چەکدار بەئار پی جی‌و بی کەی سی بۆ دانانی بۆسە لەنێوان کارگەکەو بارەگەی لیواکە، گرووپێك بەسەرپەرشتیی جەلیل سادق خورشیدو سابیر خلە گەری بۆ کۆنترۆل کردنی کارگەکە، گرووپێك بەسەرپەرشتیی تاریق عەلی بۆ دەست گرتن بەسەر ئۆتۆمبیلەکانی ناو کارگەکەدا.

هێزی پێشمەرگە لە ماوەی ۱۰ خولەکدا دەستی بەسەر رەبییەکان‌و کارگەکەدا گرت‌و هەموی تەفروتونا کراو زیانی تێکشکانی ۲ کامیۆن‌و سووتانی زیاتر لە ٥۰ گەڵابەو ٥ شۆفل لە دوژمن کەوت.

لەم چالاکییەدا کە هێزی پێشمەرگە هیچ زیانێکی نەبووە، سەباح شەوکەت قادر ناسراو بە مەلا ئاراس سەرپەرشتیی هێزەکانی کردووەو سەرباز حوسێن فەرماندەی کەرتی ۲ی شوان بەشێوەیەکی مەیدانی سەرپەرشتیی چالاکییەکەی کردووە.

ناوی بەشێك لە پێشمەرگە بەشداربووەکانی چالاکییەکە: شۆرش قەرەهەنجیری، فەیسەل بیرەسپانی، سەردار حاجی رەزا، وریا رۆژبەیانی، سەرباز کاکەرەش، خالید حەمە عەلی، عومەر رەسول، بابەی کویخا عارف، رۆستەم قەفاری، تاریق گۆگجەیی، عەبدولرەحمان سادق سلێمان، ئیبراهیم فازل ناسراو بەئیبۆ، نەهرۆ حەساری، محەمەد سەعید گورگانی، دلێر حەسەن، جەمالەسوور.

دەستکەوتی هێزی پێشمەرگە لەم چالاکییە ٣ پارچە چەك بوو، بەڵام نەتوانرا هیچ ئۆتۆمبێلێکی کارگەکە دەرباز بکرێ، بۆیە هەر هەمووی گڕی تێبەردرا.

* چالاکی گەڕەکی شاترلووی کەرکووك:-

چالاکییەکی تیپی ٢١ی کەرکوکە لە گەڕەکی شاترلوی شاری کەرکوك لە ساڵی (١٩٨٦). لە ٣١ی ئابدا پێشمەرگەیەکی تیپی ٢١ی کەرکوك لەناو شاری کەرکوك نارنجۆکێکی فڕێدایە ماڵی نۆکەرێکی ڕژێمی بەعس لە گەڕەکی شاترلوو کە بووە هۆی کوژرانی پاسەوانێك‌و برینداربوونی چەند پاسەوانێکی تر.

چالاکییەکە زۆرتر پەیامێك بوو بۆ نۆکەرانی ڕژێمی بەعس بۆ دانانی سنوورێك بۆ پەیوەندییان لەگەڵ ڕژێمدا.

* چالاکیی گوندەکانی تۆمارو گورگان:-

شەڕێکی حەوت سەعاتییە لە ٢٢ی شوباتی ساڵی (١٩٨٦) لەنێوان پێشمەرگەکانی کەرتی ٢ی شوانی سەر بەتیپی ٢١ی کەرکوك‌و هێزێکی گەورەی عێراق کە پێکهاتبوو لە فەوجێکی کۆماندۆو دوو فەوجی سووکی جاشەکان بە پاڵپشتی کەتیبەیەکی تانکی بەرازیلی‌و هێزێکی زرێپۆش‌و تیمێکی تۆپی هاوەنی ١٢٠ ملم‌و ٤ هەلیکۆپتەری جەنگی‌و ٤ هەلیکۆپتەری بارهەڵگر.

هێزەکانی عێراق هێرشیان بردە سەر هەردوو گوندی تۆمارو گورگان لە ناوچەی شوان کە تەنها یەك گرد لێکی جیادەکردنەوەو لەو کاتەدا هێزی پێشمەرگە لە هەردوو گوند بە فەرماندەیی سەرباز مام حوسێن، فەرماندەی کەرتی ٢ی شوان‌و عەلی شوانی، جێگری فەرماندەیی کەرت دامەزرابوو.

هێزەکانی عێراق سەعات ٨ی بەیانی بۆ ماوەی دوو سەعات هەردوو گوندیان بەخەستی بۆردومان کردو سەعات (١٠) هێرشەکەیان دەستپێکرد بەڵام خۆراگریی هێزی پێشمەرگەو هێزی پشتگیری هەموو هێرشەکانی تێکشکاند.

دوا بەدوای شکانی هێرشەکان، هەلیکۆپتەرەکان کەوتنە موشەکبارانکردنی هەردوو گوند. لە نیوەڕۆ بەدواوە، هێرشی هێزی پێشمەرگە دەستی پێکردو زیانێکی زۆری لە گردبوونەوەی هێزەکانی دوژمن داو دەستیان بە کشانەوەکرد.

لەم شەڕەدا زیانێکی گیانیی زۆر لە هێزەکانی دوژمن کەوت، یەك تانك‌و یەك پیکاب تێکشکێنران‌و هەلیکۆپتەرێکیش پێکرا. هێزی پێشمەرگە ٣ شەهیدی هەبوو کە بریتین لە ئیحسان کەریم شەریف، سەباح شەوکەت قادر ناسراو بەمام ئاراس‌و حەمە شوکر بەکر سالح.

پێشمەرگەکانی بەشداربووی ئەم نەبەردە (جگە لەوانەی لەمەوبەر ناویان هاتووە). ڕۆستەم حەمە بۆر ناسراو بە ڕۆستەم قەفاری، تاریق عەلی ناسراو بەباپیرە، حەسەن نافیز، تاریق گۆگجەیی، ئیبراهیم فازڵ ناسراو بە ئیبۆ، سەردار حاجی ڕەزا، عومەر محێدین، عومەر ڕەسول، هەڵکەوت عەبدوڵڵا، فەیسەڵ بیرەسپانی، وریا ڕۆژبەیانی، خالید حەمە عەلی، بابەی کویخا عارف، ناسیح ڕەشید بەکر ناسراو بەمام ناسیحە ڕەش، شاخەوان سەعید زەردکی، حەمە زیاد مام عومەر ڕۆژبەیانی، نەبەز کۆچەکی، سەربازکاکەڕەش، سەرتیپ حەساری، فەرهاد حەساری، ئەحمەد گۆگجەیی، نەهرۆ حەساری، نەجات سادق کۆچەکی، حەسیب حاجی بەیخان، لەتیف گورگانی، سەلام حەمە ڕەزا، حەسەن هەیبەیی، عاسی مەدحەت، بەکر سەقەر، ئازاد چەڵتکە، ئەحمەد دەروێش مامە قالەی دەلۆ، فەرحان گۆگجەیی، ئەحمەد کرێکار، هەڵۆ بیرەسپانی‌و جەنگی حوسێن.

تۆمارو گورگان: دوو گوندی ناوچەی شوانن نزیکەی ٢٠ کیلۆ مەتر لە ناوەندی ناحیەی شوانەوە دوورن، کەوتوونەتە نێوان گوندی مام ڕەش‌و عەلی موسا لە ڕۆژهەڵاتدا، گوندی قەفار لە باشووردا، گوندی جولحان لە ڕۆژئاواداو گوندی قەمبەر لە باکووردا. لە کاتی شاڵاوی ئەنفالەکاندا، دانیشتوانی ئەم دوو گوندە بۆ ناوچەکانی هەردوو پارێزگای سلێمانی‌و هەولێر ڕاگوێزران.

* ئۆپەراسیۆنی ناوچەی سەنگاو:-

ئۆپەراسیۆنی گرتنی شارۆچکەی سەنگاو بۆ جاری دووەم لەیەك ساڵدا. پاش نزیکەی ٩مانگ لە گرتنی شارۆچکەی سەنگاو بۆ جاری یەکەم، لە ٢٠ ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٨٦) بۆ دووەم جار لەلایەن تیپەکان مەلبەندی یەکەوە لە ماوەیەکی پێوانەییدا دیسان دەستی بەسەردا گیرایەوە.

بەپێی پلانەکە، سەرەتا دەست بەسەر هەموو ڕەبییەکانی دەورووبەریدا گیراو پێش نیوەڕۆ هێرشی پێشمەرگە بۆ ناو شارۆچکە دەستی پێکرد. ئەو ماوەیەی کە تێیدا پێشمەرگە بە گرتنی ڕەبییەکاندا خەریك بوو، دەرفەتی بەژمارەیەکی زۆری جاشەکانی ناو شارۆچکەکەو لێپراسراوە بەعسی‌و حکومییەکان دا لە شار بچنە دەرێ‌و هانا بۆ سەربازگەی دەرەوەی شارۆچکەکە ببەن.

سەرەڕای هەوڵی هێزی پێشمەرگە، نەتوانرا دەست بەسەر سەربازگەکەدا بگیرێ. پاش ئەوەی هێزی پێشمەرگە هەموو ئامانجەکانی لەناو شارۆچکەکە بەدەستهێنا، شارەکەی بەجێهێشت‌و گەڕایەوە بۆ شوێنەکانی خۆی.

ئەم ئۆپەراسیۆنە بەڕابەرایەتیی شەوکەت حاجی موشیرو بەهاوکاریی مەحمود سەنگاوی‌و عادل شوکرو حەمە ڕەش، جێبەجێ کرا. هێزی پێشمەرگە لەم ئۆپەراسیۆنەدا دوو شەهیدی هەبوو کە بریتین لە هەمزە ڕەش فەرماندەی مەفرەزەو بەکر باجەڵان لە هێزی پشتگیری.

* چالاکی ناحیەی قەرەهە نجیر:-

ڕووداوی کەوتنی فڕۆکەیەکی سیخۆڕی لە نزیك شارۆچکەی قەرەهەنجیرلە پارێزگای کەرکوك، لەسەروبەندی ئۆپەراسیونی قەیوان – ماوەت کە لە ئەیلولی ساڵی (١٩٨٦) دەستی پێکرد بووو ناوچەیەکی بەربڵاوی گرتبۆوە، هێزەکانی عێراق ستراتیجی خۆیان لەسەر بنەمای کارکردن بۆ گرتنی گوندی قەیوان‌و ئەودیوی کارێزەو قامیش‌و دۆڵبێشك‌و دەروازەی دۆڵی سەفرەو زەنون دارشتبوو بەمەبەستی دابڕانی هێزی پێشمەرگە لە سنووری عێراق– ئێران‌و برینی ڕێگای هاوکاریی مەیدانیی نێوان هێزی پێشمەرگەو سوپای پاسدارانی ئێران.

تا ٩ی ئەیلول هێزەکانی عێراق ٥١ هێرشیان کردبووە سەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگە لەو بەرەیەی کە دواتر بە بەرەی قەیوان – ماوەت ناوی دەرکرد بەبێ ئەوەی هیچ پێشکەوتنێکی بەرچاو بەدی بێنن.

لە ١٠ ی ئەیلولدا فەرماندەیی سوپای عێراق بڕیاریدا فڕۆکەی جەنگی بۆ شکاندنی ورەی پێشمەرگەو بۆردومان کردنی بارەگاکانی سەرکردایەتیی یەکێتی بەکار بێنێ. هەر ئەو ڕۆژە، سەعات ١٤ حەوت فڕۆکەی سیخۆی زۆر بەسەختی کەوتنە بۆردومان کردنی گوندەکانی دۆڵی جافاتی، لەئاکامدا دوو هاووڵاتی شەهید کران و ١٧ هاووڵاتیی دیکە بریندار بوون، سەرباری زیان گەیاندن بە ١٧ خانوو.

لە ١٤ ی ئەیلولدا دوو فڕۆکەی سیخۆی کەوتنە بۆردومان کردنی دۆڵی جافەتی و زۆر بە خەستی گوندی یاخسەمەریان بۆردومان کرد کەبارەگای سکرتێری گشتیی یەکێتیی لێ بوو. هێزی پێشمەرگە بەچەکی دژە ئاسمانی بەرپەرچی هێرشە ئاسمانییەکانی دایەوەو لەم سەروبەندەدا یەکێ لەدوو فڕۆکەکە پێکراو بەپەلەپرووزێ مەیدانی شەڕی بەجێ هێشت. لەنزیک سەربازگەی سوسێ، فڕۆکە پێکراوەکە باری قورسی خۆی فڕێداو ڕووی کردە فڕۆکەخانەی سەربازیی کەرکوك بەڵام لە نزیك قەرەهەنجیر لە ئاسماندا گڕی گرت و کەوتە خوارێ.

* چالاکی ناحیەی سەنگاو:-

ئۆپەراسیۆنی گرتنی شارۆچکەی سەنگاو لە ساڵی (١٩٨٦). لە ٩ی مانگی ئادار، مەڵبەندی یەك دەستی بە جێبەجێکردنی پلانی گرتنی شارۆچکەی سەنگاو کرد کە پێشتر ئامادەکاریی پێویستی بۆ کرابوو. هێزی پێشمەرگەو هێزی پشتگیریی لە سێ قۆڵەوە هێرشیان کردە سەر شوێنە دیاریکراوەکان و لە ماوەیەکی پێوانەییدا دەستیان بەسەر ڕەبیەکان و بارەگای ڕێکخراوی حیزبی بەعس و بارەگای دەزگای ئەمن و بینای بەڕێوەبەراتیی ناحیەو مۆڵگەی جاشەکاندا گرت و شارۆچکەکەیان لە هێزەکانی سەر بە حکومەتی عێراق پاك کردەوە.

لە ئاکامی ئەم ئۆپەراسیۆنەدا هێزەکانی حکومەت (٣٥) کوژراویان لێکەوت و (٢٥) کەسیشیان لێ بەدیل گیرا، لەوانە بەڕێوەبەری ناحیەکە فەرید عەزیز بەگ و لە ئاکامی شەڕی ناو شارۆچکەکەدا (٤) ئۆتۆمبێلی حکومی سوتێنران و (٣) جبەخانەی گەورەی چەکیش تەقینەوە.

دەستکەوتی، هێزی پێشمەرگە بە مجۆرە بوو: ٤٣ کلاشنکۆف، ٢ برنەو، ٤ دەمانچە، یەك ئار بی کەی، یەك ئار بی جی و یەك ئۆتۆمبێلی سوپەر. لەم ئۆپەراسیۆنەدا هێزی پێشمەرگە ٦ پێشمەرگەی لە دەستدا کە بریتی بوون لە مشیر ئەحمەد، مەحمود محەمەد ئەمین، باقی عەزیز فەرەج، فایەق ئەمین، یەحیا حەسەن و ڕەحیم کەریم.

هێشتا هێزی پێشمەرگە لەناو سەنگاودا بوو کاتێك هێزەکانی عێراق کەوتنە تۆپباران کردنی سەنگاو و گوندەکانی دەورووبەری. ئەو تیپانەی لەم ئۆپەراسیۆنەدا بەشدار بوون بریتین لە تیپەکانی ٥١ی گەرمیان و ٥٣ی شێروانە و ٥٧ی سەگرمە و ١٥ی شارەزوور ١٧ی زمناکۆ تیپی مەڵبەندی یەك.

سەنگاو: شارۆچکەیەکە (٨٢) کیلۆ مەتر لە باشووری ڕۆژهەڵاتی کەرکوکەوە دوورە، لە باکووردا بەرێگایەك بە چەمچەماڵەوە بەستراوەتەوە، لە باشووردا بەباوەنوورو کەلار کفرییەوە، لە ڕۆژهەڵاتدا بە قەرەداغەوە لە ڕۆژئاوادا بە قادر کەرەمەوە. ئەم شارۆچکەیە لە ڕێی چەمچەماڵەوە بە سلێمانی و کەرکوکەوە بە ستراوەتەوە هەروەها لە قەرەداغیشەوە پەیوەندی بە سلێمانییەوە دەکات.

* چالاکی ناحیەی قەرەهەنجیر:-

چالاکییەکی کەرتی ٣ی جەباریی سەر بەتیپی ٢١ی کەرکوکە لە ١٩ ی تەموزی ساڵی (١٩٨٦) لەسەر جادەی کەرکوك – سلێمانی بە دووریی پێنج کیلۆ مەتر لە قەرەهەنجیرەوە کە بە گرتنی ڕەبایەیەکی سەر جادەکە کۆتایی هات.

هێزەکە لە سەعات ١٦ادا بۆسەی بۆ کاروانێکی سەربازی دانابوو کە چاوەڕوان دەکرا لە قەرەهەنجیرەوە بەرەو چەمچەماڵ بچێ، بەڵام بەرێ نەکەوتنی کاروانەکە، ئۆپەراسیونەکەی پوچەڵ کردەوە. بۆیە کەرتەکە شوێنەکەی بەجێ هێشت و کشایەوە.

بەڵام سێ پێشمەرگەی کەرتەکە بەناوی شێرزاد موەفەری و شەماڵ ئۆمێك و سەباح ئۆمەرگەدە، بەبێ ئاگاداریی کەرتەکە، جیابوونەوەو نەخشەی هێرشکردنە سەر ڕەبییەیەکی جەیش شەعبیی نزیك شوێنی بۆسەکەیان دانا.

بەپێی ئەو نەخشەیەی کە دایاننابوو، لەسێ قۆڵەوە هێرشیان کردە سەر ڕەبییەکەو لە ماوەیەکی پێوانەییدا توانیان دەست بەسەر نیوەی ڕەبییەکەدا بگرن و شەڕ بخەنە ناو ڕەبییەکەوە. لەشەڕی ناو ڕەبییەکەدا، پێشمەرگەیەك شەهید بوو، یەکێکیش تەقەی لێکراو بەرکەوت. بەمجۆرە، پێشمەرگەکان تەنگیان پێ هەڵچنراو ئۆپەراسیونەکە وەرچەرخایە سەر ئەوەی کە شکست بێنێ. بەڵام لەو کاتەدا پێشمەرگەکانی کەرتەکە فریای ئۆپەراسیونەکە کەوتن، لەچەند قۆڵێکەوە هێرشیان کردە سەر ڕەبییەکەو توانیان دەستی بەسەردا بگرن.

لەم چالاکییەدا دوژمن ١٣ چەکداری جەیش شەعبیی لێ کوژرا کە لەناو ڕەبییەکەدا بوون و هەر هەموشیان عەرەبی تکریتی بوون و هێزی پێشمەرگە دەستی بەسەر ١٣ پارچە چەکدا گرت. هەروەها ئۆتۆمبیلێکی ئەلبیی عەسکەریی پڕ تەقەمەنی لەکاتی شەڕەکەدا تەقییەوە و ڕەبییەکەش گڕی تێ بەردرا.

لەو سێ پێشمەرگەیەی کە بەدەستپێشخەریی خۆیان نەخشەی هێرش کردنە سەر ڕەبییەکەیان دانابوو، یەکێکیان کە شەماڵ ئۆمێکە شەهید بوو، یەکێکیش بریندار بوو. لەو پێشمەرگانەی دواتر چوونە ناو شەڕەکەوە، کەس هیچی لێ نەهات.

پاش چالاکییەکە هێزی پێشمەرگە بۆ گوندی خالۆبازیانی کشایەوە. بەیانییەکەی، چەند هەلیکۆپتەرێکی جەنگی چوونە سەر گوندەکەو بۆردومانیان کرد، لە ئەنجامدا چەند





دەستگیرکردنی ئەندازیارە فلیپنیەکان یارمەتی ورووژاندنی مەسەلەی گیرانی (٢٢٨) لاوو منداڵەکەی شاری سلێمانی داو بەستنەوەی ئازادکردنی ئەندازیارە فلیپنییەکان بە ئازادکردنی لاوو منداڵە کوردەکانەوە فشاری لەسەر حکومەتی عێراق دروست کرد. دوا بە دوای ئەم چالاکییەو ورووژانی مەسەلەی گیرانی لاوو منداڵەکانی سلێمانی لە میدیاکانی جیهاندا، حکومەتی عێراق وردە وردە دەستی بە ئازادکردنی لاوو منداڵەکان کرد. هێزی پێشمەرگەش ئەندازیارە فلیپنییەکانی بەردا.

*** چالاکی گوندی وەسمان لەکە :-**

شەڕێکە لە ٢٧ی نیسانی ساڵی (١٩٨٧) هێزی پێشمەرگە لە پێشمەرگە لە گوندی وەسمان لەکەی ناوچەی قەرە حەسەن لە پارێزگای کەرکوك لە دژی هێزێکی گەورەی سوپای عێراق بەڕێوەی بردووە.

هێزی پێشمەرگە لە هێزی هاوبەشی کەرتی ٤ی جەباریی سەر بەتیپی ٥٧ی سەگرمە بەفەرماندەیی سەمەد گلیو مەفەرەزەیەکی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بەفەرماندەیی هاوڕێ برواو مەفەرەزەیەکی هێزی پشتگیریی گوندی خاڵەبازیانی بە فەرماندەیی وەستا برایم پێکهاتبوو، پاشان لە کاتی شەڕەکەدا هێزی تر چووە پاڵ هێزی پێشمەرگەوە.

ئامانجی هێرشەکەی هێزەکانی عێراق، روخاندنو کاول کردنی گوندی وەسمان لەکە بوو. هێزەکە بەپاڵپشتی تانكو زرێپۆشو هەلیکۆپتەری جەنگیو فرۆکەی پیلاتۆزو فەوجی سووكو چەند گرووپێکی میلیشیاکانی جەیشی شەعبی هێرشی کردە سەر گوندەکە.

لەگەڵ گەیشتنی هەواڵی بەڕێکەوتنی هێزەکانی عێراق بەرەو گوندی وەسمان لەکە، هێزی پێشمەرگە لەناو گوندو دەوروبەری سەنگەری لێداو تا هێزەکانی دوژمن نەچوونە ناو گوند تەقەیان لێ نەکرا. بۆیە هەر لەیەکەم دەسترێژی گوللەدا، ژمارەیەکی زۆری سەرباز کوژرانو چەندین پارچە چەك کەوتنە دەست پێشمەرگە.

هێزەکانی عێراق گوندەکەیان دایە بەر هاوەن. تا سەعات ١٣ هەموو هێرشەکانی دوژمن بۆ سەر گوندەکە تێکشکان بەڵام فشاری دوژمن لەسەر پێشمەرگە زۆر زیاد کرد. لەدوای سەعات ١٣ وردە وردە هێزی تر بەفریای پێشمەرگەکانی ناو گوند چوون. مەفرەزەیەکی سەیاح ئومەرە گەدەییو هێزی پێشگیریی ناوچەی جەباری خۆیان گەیاندە گوندەکەو بوونە مایەی بەهێزکردنی گیانی بەرگری. وردە وردە شەڕەکە دەوروبەری گوندی تەنییەوەو هێزەکانی دوژمن هەستیان بەوە کرد کە کەوتونەتە تەپکەوە، لەترسی گەمارۆدان لە سەعات ١٥دەوە دەستیان بەکشانەوەیەکی خێرا بەرەو لەیلان کرد.

لەرێگای پاشەکشەیاندا، هێزە کشاوەکان لە نزیك گوندی شوانە کەوتنە بۆسەی هێزی پشتگیریی گوندەکانی خاڵەبازیانیو حوسێن ئیسلامو شێخ جیرییەوەو ژمارەیەکیان لێ کوژرا.

لەم شەڕەدا هێزەکانی عێراق ٣٨ سەربازییان لێ کوژراو هاووڵاتییەك شەهید بوون.

*** چالاکی گوندی ( پارە پارە ):-**

چالاکی دەستگیرکردنی سێ ئەندازیاری فلیپینی لە گوندی (پارە پارە) لە ناوچەی گەرمیان. لە (٣)ی تەمووزی ساڵی (١٩٨٧) مەفرەزەیەکی کەرتی (٥)ی تیپی (٥١)ی گەرمیان لە پرۆژەی پەلەوەری گوندی (بارە پارە) کە دوو ساعاتە رێ لە خوارووی هێڵی ئاسنینی (بەغدا - کەرکوك)ەوەیە، دوو ئەندازیاری کارەبا وەیەك ئەندازیاری میکانیکی، سێ ئەندازیاری بەرەگەز فیلیپینی گرت بە ناوی (ریبل روباریو، سێ سرئیکاراندۆم، لیندۆ پیلاکرون). دەربارەی دەستگیرکردنی سێ ئەندازیارە فلیپینییەکە، نوێنەری یەکێتی نیشتمانیی کوردستان لە هەندەران بە ئاژانسی هەواڵی رۆیتەری راگەیاند کە بۆ ئازاد کردنی هاووڵاتییە فلیپینیە دەستگیر کراوەکان، پێویستە لەسەر حکومەتی فلیپینی گووشار بخاتە سەر حکومەتی عێراق بۆ ئازادکردنی (٢٢٨) لاوو منداڵی کورد کە حکومەتی عێراق لە شاری سلێمانی گرتبوونی بە مەبەستی دروستکردنی فشار لەسەر باوكو کەسوکاریان کە پێشمەرگە بوون. نوێنەری یەکێتیی ئەوەشی راگەیاند کە کەسووکاری ئەندازیارە دەستگیرکراوەکان دەتوانن نامەو شتومەکیان بۆ بنێرن ولە رێ ئۆمنییەکانی نوێنەرایەتیی یەکێتی لە ئەورووپاو دیمەشق و تاران دەتوانن پەیوەندییان پێوە بکەن.

زرێپۆشێك‌و چەند ئۆتۆمبیلێکیان لەکار خرا. لە هێزی پێشمەرگە هاوڕێ بروا، لێپرسراوی ناوچەی کەرکوکی پارتی کۆمۆنیستی عێراق شەهید بوو، چوار پێشمەرگەش بریندار بوون.

ناوی هەندێ لەو پێشمەرگانەی کە لەم شەڕەدا بەشدار بوون: کەریم باشبلاخی، کامیل ژاڵەیی، خالد خاڵە بازیانی، ئەحمەد خاڵە بازیانی، سەید عەلی جەباری، شێرزاد موەفەری.

*** شەڕی گوندی کارێزی خاڵخاڵان:-**

شەڕێکە لەنێوان هێزێکی گەورەی سوپای عێراق بەسەرپەرشتیی جەنراڵ بارق عەبدوڵڵا حاجی حونتەو نێوان هێزەکانی کەرتی ٢ی شوانی تیپی ٢١ی کەرکوك‌و مەفرەزەیەکی پارتی کۆمۆنیستی عێراق لە ٦ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٨٧) لە ناوچەی خاڵخاڵان.

هێزەکەی دوژمن کە لەدەورووبەری پێنج هەزار سەربازی کۆماندۆ پێکهاتبوو، بەمەبەستی سوتماك کردنی خاکی ناوچەکانی سنووری هەردوو تیپی ٢١ی کەرکوك‌و ٢٥ی خاڵخاڵان هەڵکشابووە سەر دەڤەرەکە.

پاش بڵاوبوونەوەی هێزەکانی دوژمن بەناوچەکەدا، هێزی پێشمەرگە لە گوندی مۆردخوادەی خاڵخاڵانەوە بەرەو گوندی کارێزەی خاڵخاڵان بەرێکەوت. شەڕ سەعات ٣٠، ٢٣ دەستی پێکرد، پێشمەرگەکانی یەکێتی لەسێ قوڵەوە هێرشیان کردە سەر دوژمن‌و پێشمەرگەکانی پارتی کۆمۆنیست لە قوڵێکی ترەوە. شەڕ تا سەعات ٢ درێژەی کێشا. هێزی پێشمەرگە دوو کیلۆ مەتر زیاتر هێزەکانی دوژمنی راونا. زیانی مالیی دوژمن بەم جۆرە بوو: سووتانی یەك زرێپۆش‌و یەك جێبی گاز قیادەو ئیڤاو ئۆتۆمبیلێکی سکانیاو شۆفڵێك کە هێزەکانی سوپا بۆ روخاندنی گوندەکان بەکاریان دەهێنا. هەشت هاوەنی ٨٢ملم‌و ١٥ کلاشنکوف‌و ئار پی جییەك دەستکەوتی هێزی پێشمەرگە بوو. لەبەر سەختیی شەڕەکەو زۆریی هێزەکەی دوژمن، نەتوانرا دەست بەسەر ژمارەیەکی زۆری دەستکەوتدا بگیرێ. لەم شەڕەدا دوژمن زیاتر لە ١٥٠ کوژراوو زیاتر لە ١٠٠ برینداری هەبوو. سەربازێکیش بەدیل گیرا، بەڵام لە ئەنجامی شەڕی دەستەویەخەدا، بەگوللەی سەربازەکان گیانی لە دەستدا.

هێزی پێشمەرگە سێ شەهیدی هەبوو: دوانیان یەکێتین‌و بریتین لە نەسرەددین عەبدوڵڵا پیرەجانی‌و سەیفەددین بیرەسپانی‌و ئەوی تر ناوی زمناکۆ بوو، ئەندامی پارتی کۆمۆنیست بوو.

*** چالاکی گوندی شێخ جیریی سەروو:-**

شەڕێکی دەستەویەخەیە لەناو گوندی شێخ جیریی سەروو لە ناوچەی قەرەهەنجیر لە ١٦ ی ئایاری ساڵی (١٩٨٧) لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزێکی بەربڵاوی سوپای عێراق بە فەرماندەیی جەنراڵ بارق عەبدوڵڵا حنتە.

گوندەکەلە سنووری پشتێنەی ئەمنیدا بوو. رژێمی بەعس وای دانابوو هەر گوندێکی دەورووبەری کەرکوك لە سنووری پشتێنەی ئەمنیدا بێ، دەبێ بروخێندرێ. بەم پێیە، هێزێکی بەربڵاوی سوپای عێراق کە پێکهاتبوو لە زرێپۆش‌و هێزی کۆماندۆ بەپاڵپشتی پێنج هەلیکۆپتەری جەنگی بەرەو گوندەکە بەرێکەوت. گوندەکە لە بنەڕەتدا چۆڵ کرابوو. هێزەکانی سوپا دەیانویست بیروخێنن تاکو پێشمەرگە وەك بنکەو بۆ حەوانەوە سوودی لێ وەرنە گرێ. بۆیە، کاتێك هێزەکانی سوپا شۆفڵەکانیان پێش خست‌و روویان لە گوندەکە کرد، وایاندەزانی کەسی لێ نییە. لەو کاتەدا ٢٢ پێشمەرگەی کەرتی ٤ی جەباری بەفەرماندەیی سەمەد گلی لەناو گوندەکەدا بوون‌و خۆیان بۆ بەرەنگاریی هێرشەکە ئامادە کردبوو. لەگەڵ نزیکبوونەوەی شۆفڵەکان‌و سەربازەکان، پێشمەرگەکان دایانە بەر دەسترێژی گوللەو شەڕ دامەزرا.

لەکاتی شەڕەکەدا پێشمەرگەکان دەستیان بەسەر هۆکی تۆکییەکدا گرت کە پەیوەندیی راستەوخۆی لەگەڵ جەنراڵ بارق عەبدوڵڵا حنتەدا هەبوو، بەهۆی ئەم دەڤگایەوە ئاگادرای هەموو ئەو فەرمانانە بوون کە فەرماندەی هێرشەکە بۆ سەربازەکانی دەردەکرد.

بەرلەوەی گوندەکە تۆپ باران بکرێ، پێشمەرگەکان بەهۆی دەزگاکەوە ئاگادرای تۆپبارانەکە بوون، بۆیە خێرا لە گوندەکە چوونە دەرێ‌و پاش وەستانی تۆپبارانەکەو دەستپێکردنی هێرشی دوژمن، گەڕانەوە بۆ ناو گوند. شەڕ زۆری خایاند، بەڵام بەرلەوەی هێزەکانی سوپا بکشێنەوە، هێزێکی زۆری پێشمەرگەی کەرتەکانی ترو مەفرەزەیەکی پارتی کۆمۆنیستی عێراق‌و هێزی پشتگیری بۆ پشتیوانیی پێشمەرگەکانی کەرتی ٤ی جەباری، بەهانایانەوە چوون.

لەم شەڕەدا هێزەکانی عێراق سەد سەرباز زیاتریان لێ کوژرا کە هەموویان لە هێزی کۆماندۆ بوون. لە هێزی پێشمەرگە دوو شەهید هەبوو کە بریتی بوون لە مەجید بایز ناسراو بە مەجید کۆمەڵەو شۆڕش رەشید. دەستکەوتی هێزی پێشمەرگە ٥ ئارپی جی‌و ٧ کلاشینکۆف‌و ٢ قەناس‌و یەك دەمانچەو یەك دەزگای بێسیم بوو. هێزەکانی عێراق زرێپۆش‌و شۆفڵێکیان لە گوندەکە بە تێکشکاوی بەجێ هێشت.

*** چالاکی گوندی سوورکەل:-**

چالاکییەکی کەرتی تیپی ٢١ی کەرکوکە لەسەر رێگای شوان - کەرکوك لە ١٢ی ئەیلولی ساڵی (١٩٨٧)، کەتێیدا کاروانێکی هێزەکانی عێراق کەوتە بۆسەی پێشمەرگەوە.

پاش کۆکردنەوەی زانیاریی پێویست دەربارەی هاتووچۆی هێزکانی عێراق لە ناوچەکە، لە نزیك گوندی سوورکەل پێشمەرگەکان بوون بەسێ بەش‌و سێ بۆ سەیان دانا. بۆسەی یەکەم لە کەلێنی خدری زیندەوە بەرەو شوان کە پێشمەرگەکانی لەسەفەر قولی بەگی، محەمەد گەلۆزی‌و رەحمان حەمەدەمین قولی بەگی پێکهاتبوون، بۆسەی دووەم، لەسەر رێگای جانقز کە پێشمەرگەکانی لە حەمەسوور شیوانی فەرماندەی کەرتی تیپی ٢١ی کەرکوك، محەمەد گورگانی، کارزان عەلی رێدار، فەرهاد قەفاری، وریا عەرەب، فوئاد کەرکوکی‌و چەند پێشمەرگەیەکی تر پێکهاتبوون.

بۆسەی سێیەم لەحەسار تەها دانراو پێشمەرگەکانی لە ئاواتە ڕەش جێگری فەرماندەی کەرتی تیپەکە، عومەر چاوشین، کاوە سوور، خولە سەربڕی، گەنج خەلیل، بورهان کاکل و چەند پێشمەرگەیەکی تر پێکهاتبوون.

پاش دوو سەعات و نیو لە دانانی بۆسەکە، لەسەعات ٦،٣٠ ی سەر لە بەیانی، هێزێکی سوپای عێراق کە پێکهاتبوو لە ئیفایەک و شۆفرلێتێکی پیکاب و بەرازیلییەک کەوتە بۆسەکەوەو پێشمەرگەکان دایانە بەر دەستڕێژی گوللە. لە ماوەی نیو سەعاتدا پێشمەرگە ١٣ سەربازو ١٠ جاشی بەدیل گرت و دەستی بەسەر هەر سێ ئۆتۆمبێل و ١١ کلاشنکۆفدا گرت. پێشمەرگە هیچ زیانێکی نەبوو.

*** شەڕی ئۆمەربل**

شەڕێکە لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزەکانی سوپای عێراق لە گوندی ئۆمەربل لە ناوچەی گەرمیان لە (١٨ی ئایاری ساڵی ١٩٨٧). هێزەکانی سوپای عێراق بەپاڵپشتی تانکی ت ٥٥ لەسەر قەڵاوە لە دوو قۆڵەوە هێرشیان کردە سەر گوندەکانی ئۆمەربل و گۆپان عارەب بەمەبەستی تەخت کردنیان. پێشمەرگەکانی تیپی ٥١ی گەرمیان و هێزی پشتگیری لێیان هاتنە دەست و بەرسنگی هێرشەکەیان گرت. هاوکات لەگەڵ ئەم تێکرژانەدا پێشمەرگەکانی تیپی ٥٣ی شێروانە خۆیان گەیاندە گوندەکەو شانبەشانی پێشمەرگەکانی تیپی ٥١ی گەرمیان بەرپەرچی هێرشەکەیان دایەوە. پاش درێژەکێشانی شەڕەکە، پێشمەرگەکانی کەرتی ٤و کەرتی ٥و کەرتی ٦ی تیپی ٥١ی گەرمیان و ناوچەی یەکێتیی شۆڕشگێڕان و مەفرەزەی کاروباری کۆمەڵایەتیی تیپی ٥١ی گەرمیان و هێزی پشتگیریی گوندەکانی تر بەهانای هێزی پێشمەرگەوە چوون.

ساعات ١٦:٣٠ پێشمەرگە دژە هێرشی دەستپێکردو لە ماوەی یەک سەعاتدا هێزەکانی سوپای عێراق دەستیان بەپاشەکشە کرد. لە ئاکامی شەڕەکەدا هێزەکانی عێراق زیاتر لە ٩٠ سەربازییان لێ کوژرا، لاشەی ٣٤ سەرباز لە شەرگە بەجێما، زیانی ماددیی سوپا بریتی بوو لە سووتانی ٣ تانک و ١٢ شۆفل.

لەم شەڕەدا پێشمەرگە یەک تانکی بەرازیلیی بە ٨٠ گوللەوە گرت کە دواتر گەیەنرایە ناوچەی قەرەداغ، سەرباری ٥ شۆفڵ و ٣ دۆشکەو ٣٠ کلاشینکۆف و یەک دەزگای بێ سیمی جۆری ڕاکاڵ، زیانی پێشمەرگە ٣ شەهیدو یەک شەهیدی هێزی پشتگیری بوو.

ئۆمەربل: ١٥ کیلۆ مەتر لە کفرییەوە دوورە، پێش شاڵاوی ئەنفال نزیکەی ١٢٠ ماڵ دەبوو، لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو سوپای عێراق سووتاندویەتی و لە ساڵی ١٩٨٣ بەر هێرشی هەلیکۆپتەر کەوتووە. لە شاڵاوی ساڵی ١٩٨٨ی ئەنفالدا دەورووبەری ٢٠٠ کەسی لێ ئەنفال کراوە.

*** ئۆپەراسیۆنی تەقتەق:-**

ئۆپەراسیۆنی گرتنی شارۆچکەی تەقتەق لە ٢٩ی ئایاری ساڵی (١٩٨٧). پێش نیوەشەو بەماوەیەکی کەم، هێزێکی هاوبەش لە پێشمەرگەکانی تیپی ٢١ی کەرکوک و تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان و هێزێکی هاوبەش لە تیپەکانی سەر بەمەڵبەندی ٣و هێزی پشتگیری، لە دوو قۆڵەوە هێرشیان کردە سەر چەند شوێنێکی دیاریکراو لەناو شارۆچکەی تەقتەق لەوانە بارەگای سریەی فەوجی ٧٥، بارەگای سریەی نزیک پرۆژەی پەلەوەر، بارەگای بەڕێوەبەری ناحیە، بارەگای فەوجی سووکی ١٤٩، بارەگای حیزبی بەعس، بنکەی پۆلیس، بارەگای مەفرەزە تایبەتەکانی جاش، بارەگای میلیشیای جەیش شەعبی و چەند ڕەبییەیەکی دەورووبەری شارۆچکەکە.

شەڕ لەناو شارو دەورووبەری دامەزراو بەشێکی زۆری شارۆچکەکە تا بەیانی لەژێر کۆنترۆڵیی پێشمەرگەدا بوو، لەم ئۆپەراسیۆنەدا هێزەکانی عێراق ١٦٠ کوژراویان هەبوو، ٤٧ سەربازو پۆلیس و جاشیش بەدیل گیران. هێزی پێشمەرگە ٤ شەهیدی هەبوو، لەوانە عەبدولرەحیم عەبدوڵڵا لێپرسراوی بەشی پێشمەرگایەتیی مەڵبەندی ٢ کە مەکتەبی سیاسی بە بۆنەی شەهیدبوونییەوە بەیاننامەی دەرکرد.

ئۆپەراسیۆنی گرتنی شارۆچکەی تەقتەق بۆ جاری دووەم لە مانگی ئەیلولی ساڵی (١٩٨٧). چوار تیپ کە بریتین لە تیپی ٢١ی کەرکوک، تیپی ٢٣ی سووورداش، تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان و تیپی ٩٣ی کۆیە پلانیان بۆ گرتنی شارۆچکەی تەقتەق دانابوو. شەوی ١٤ لەسەر ١٥ی ئەیلول دەستیان بەجێبەجێ کردنی پلانەکەکرد. ئۆپەراسیۆنەکە لەسێ قۆڵەوە بەڕێوە چوو. لە قۆڵی یەکەمدا تیپەکانی ٢٣ی سووورداش و ٢٥ی خاڵخاڵان هێرشیان کردە سەر بارەگای فەوجی سووکی ١٦٧و ڕەبییەکانی دەورووبەری و لە ماوەی یەک سەعاتدا هەر هەمووی گیرا. جاشەکان ٢٠ کەسیان لێ کوژراو ١٧ کەسیشیان لێ بریندار بوو. هێزی پێشمەرگە لەم قۆڵە دەستی بەسەر ٤٠ کلاشنکۆفدا گرت.

لە قۆڵی دووەمدا تیپی ٩٣ی کۆیە هێرشی کردە سەر دوو ڕەبییەی گردی کارەباکەو دەستی بەسەر هەردوکیاندا گرت. لەم قۆڵەدا جاشێک کوژراو دەست بەسەر ٣ کلاشنکۆفدا گیرا. لە قۆڵی سێیەمدا تیپی ٢١ی کەرکوک هێرشی کردە سەر بارەگای سریەی جاشەکان و ٤ ڕەبییەو دەستی بەسەر هەموویدا گرت. زۆربەی جاشەکان ماوەیەکی کەم پاش ئەوەی کە هێرش کرایە سەریان، شوێنەکانیان چۆڵ کردو رایانکرد. هەندێکیان لەناو تەقتەق خۆیان شاردەوە، لەوانە ٣ کەسیان دواتر گیران. پاش شەڕەکە هەموو دیلەکان ئازاد کران. زیانی پێشمەرگە یەک شەهید بوو.

*** چالاكی گەرەكی ڕەحیماوا:-**

چالاكیی مەفرەوەیەكی سەر بە تیپی ٢١ی كەركوك بە فەرماندەیی كاوە كۆچەری لە ٣ی كانوونی یەكەمی ساڵی (١٩٨٧) لە گەرەكی ڕەحیماوای شاری كەركوك. لەم چالاكییەدا پێشمەرگەكان دزەیان كردە ناو شاری كەركوك‌و هێرشیان كردە سەر یەكێ لە ڕەبیەكانی گەرەكی ڕەحیماواو توانییان دەستی بەسەردا بگرن، زیانی دوژمن لەم چالاكییەدا كوژرانی پێنج چەكداری جەیش شەعبی بوو. هێزی پێشمەرگە هیچ زیانێكی نەبوو. دەستكەوتەكانی چالاكییەكە بریتی بوون لە ٤ كلاشنكۆف‌و یەك ڕەشاشی ئار بی كەی‌و كۆمەڵێك تەقەمەنی.

مەفرەزەكە لە ٩ پێشمەرگەو ٢ ئەندامی هێزی پشتگیری پێكهاتبوو. پێشمەرگەكان: كاوە كۆچەری. ڕەفیق ئەحمەد، زێدان چیمەنی، سەركەوت چیمەنی چەتۆ كۆچەكی، هیوا پەلكە ڕەش، خەلیل پەلكە ڕەش‌و نەوزاد كاكە حەمە. ئەندامانی هێزی پشتگیریی: جوامێر دوحیلەیی و نەجمەددین دوحیلەیی.

چالاكییەكە لە تۆڵەی شەهیدكردنی ١٥ هاوولاتیی گوندی چیمەنی سەروو بوو كە هێزەكانی عێراق لە ١٢ی تشرینی دووەمدا گوللەبارانیان كردبوون‌و لە هەمان كاتدا پەیامێكیش بوو بۆ كاربەدەستە بەعسییەكانی كەركوك كە سێ پشتێنە ئەمنییەكەی كەركوك، ناتوانن بەربەست بن لەبەردەم چالاكیی پێشمەرگە لەناو شاری كەركوك.

ڕووداوی گوللەباران كردنی ئەندامێكی ڕێكخستنە نهێنییەكانی كۆمەڵەی ڕەنجدەرانی كوردستان لە گەرەكی ڕەحیماوای شاری كەركوك لە ساڵی (١٩٨٧)و دەستگیركردنی باوك‌و پێنج براو شوێنبزركردنیان.

لە ١٠ی نیسانی ساڵی (١٩٨٧) ڕێكخستنە نهێنییەكانی كەركوك چالاكییەكی شۆڕشگێڕانەیان لە گەرەكی ڕەحیماوای شاری كەركوك ئەنجام دا كەبووە مایەی كوژرانی دوو كارمەندی دەزگای ئەمنی حكومەتی بەعس. دوا بە دوای چالاكییەكە، دەزگاكانی ئەمن كەوتنە لێكۆڵینەوەی ورد لەم بارەیەوەو دەورووبەری ٢٠٠ كەسیان دەستگیر كرد. پاشان چەند ڕۆژێك ڕەفیق ساڵح سەعیدیان دەستگیر كرد كە ئەندامی ڕێكخستنەكانی كۆمەڵەی ڕەنجدەران بووو دوو برای، پێشمەرگەی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان بوون‌و تۆمەتی ئەنجامدانی چالاكییەكەی گەرەكی ڕەحیماوایان ئاراستە كرد.

لە ٢٤ی نیساندا ڕەفیق بە بەرچاوی دانیشتوانی گەرەكی ڕەحیماواوە گوللەباران كراو هەر هەمان ڕۆژ دەزگا ئەمنییەكان هەڵیانكوتایە سەر ماڵەكەی‌و ساڵح سەعیدی باوكیان‌و پێنج برایان بەناوی عادل‌و مەهدی‌و عەبدولوەهاب‌و سەلاحەددین‌و سەعدون دەستگیر كردو شوێنبزریان كردن. مەحبوبەی دایكی بەر شاڵاوی گرتنەكە نەكەوت‌و خۆی دەرباز كرد.

*** ژیاننامەی تاكەكانی خێزانەكە:-**

(ساڵح سەعید: لەدایكبووی ساڵی (١٩٢٢)ی گوندی مۆردخواردەی ناوچەی خاڵخاڵان. ساڵی (١٩٥٤) لە شاری كەركوك نیشتەجێ بووەو ساڵی (١٩٦٩) بووەتە پێشمەرگەو لە هێزی كاوە بووەتە سەرلق. لەو ساڵەدا دوو جار بەسەختی بریندار بووە.

پاش هەرەس هێنانی شۆڕش لە ساڵی (١٩٧٥)، ئاوارەی ئێران بوو. لەو ماوەیەدا ژیانێكی كولەمەرگی لە ئێران بەسەر برد، ساڵی (١٩٧٩) وازی لە ژیانی ئاوارەیی هێناو گەڕایەوە بۆ عێراق. بەو پێیەی كەدرەنگ بۆ عێراق گەڕاوەتەوە، بۆ شاری باقوبەی پارێزگای دیالە دوور خرایەوە. ساڵی (١٩٨٢) بەر لێبوردنی گشتیی كەوت‌و ڕێی پێدرا بگەڕێتەوە بۆ كەركوك.

(عادل ساڵح سەعید): لەدایكبووی ساڵی (١٩٥٢)ی شاری كەركوك. تا پۆلی شەشەمی ئامادەیی خوێندویەتی‌و دواتر سەرقاڵی كاسبی بووەو بۆتە شوفێری پاس لە هێڵی نێوان سلێمانی - كەركوك.

دوای گیرانی ڕەفیقی برای، خۆی‌و هاوسەرەكەی‌و كچەكەی دەستگیر كران. پاش سێ مانگ هاوسەرو كچەكەی ئازاد كران‌و خۆیشی بێ سەروشوێن كرا.

(مەهدی ساڵح سەعید): لەدایكبووی ساڵی (١٩٥٤)ی شاری كەركوك. ساڵی (١٩٨٥) خوێندنی لە پەیمانگای مامۆستایانی دهۆك تەواو كردو لە گوندی بەرواری باڵا بە مامۆستا دامەزرا.

ساڵی (١٩٧٥) پەیوەندیی بە كۆمیتەی ئاگری كۆمەڵەی ڕەنجدەرانی كوردستانەوە كردو لەو ماوەیەی كە لەم كۆمیتەیە كاری كردووە، هەڵسووڕاوێكی زرنگ‌و گورج‌و گۆڵ بوو.

(عەبدولوەهاب ساڵح سەعید): لەدایكبووی ساڵی (١٩٦٢)ی شاری كەركوك. ساڵی (١٩٨٢) بە كارمەند لە فەرمانگەیەكی حكومیدا دامەزراوەو هەر ئەو ساڵە پەیوەندیی بەرێكخستنەكانی كۆمەڵەی ڕەنجدەرانی كوردستانەوە كردووە.

(سەلاحەددین ساڵح سەعید): لەدایكبووی ساڵی (١٩٦٣) ی كەركوك تا پۆلی سێیەمی ناوەندیی خوێندووەو پاشان خەریكی كاسبی بووە.

(سەعدون ساڵح سەعید): لەدایكبووی ساڵی ١٩٦٣ی كوردستانی ئێران تا پۆلی یەكەمی ناوەندیی خوێندووە.

(ڕەفیق ساڵح سەعید): لەدایكبووی ساڵی (١٩٦٨) شاری كەركوك. مێژووی پەیوەندی كردنی بەرێكخستنەكانی كۆمەڵەی ڕەنجدەرانی كوردستانەوە دیار نییە. لە ٢٤ی نیسانی ساڵی (١٩٨٧)دا لە گەرەكی ڕەحیماوای شاری كەركوك بە بەرچاوی دانیشتوی گەرەكەكەوە گوللەباران كرا.

(عەبدولهادی ساڵح سەعید): ناسراو بە دكتۆر هادی. لەدایكبووی ساڵی (١٩٥٧)ی شاری كەركوك. دەرچووی پەیمانگای پزیشكییە. ساڵی (١٩٨٠) پەیوەندیی بەرێكخستنەكانی كۆمەڵەی ڕەنجدەرانی كوردستانەوە كردووەو ساڵی (١٩٨٢) بۆتە پێشمەرگەی تیپی ٢١ی كەركوك. دواتر بۆتە فەرماندەی مەفرەزە لە هەردوو تیپی ٢١ی كەركوك‌و ٢٥ی خاڵخاڵان.

لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا دوو جار بریندار بووە. لە ٢٣ی

ئازاری ساڵی (١٩٨٨)دا کاتێك فڕۆکەکانی عێراق بەچەکی کیمیایی گوندی شاناخسێی ناوچەی چوارتایان بۆردومان کرد. شەهید کرا.

(مەحبوبە عوسمان): خێزانی ساڵح سەعیدو دایکی هەر شەش شەهید. لەدایکبووی ساڵی (١٩٣٧)ی شاری کەرکوك. لە رێکخستنە نهێنییەکاندا وەك نامەبەر کاری کردووە. ساڵی (١٩٨٧) دوای گوللەباران کردنی کوڕێکی و دەستگیرکردنی هاوسەرەکەی و پێنج کوڕی دیکەی، خۆی گەیاندە گوندی مۆردخوارده. تا راپەڕینی ساڵی (١٩٩١) بە ئاوارەیی کولەمەرگی و خۆحەشاردان، ژیانی بەسەر بردووە. ساڵی (١٩٩٤) لە تەمەنی ٥٧ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

*** چالاکی بانە ژریژەکە:-**

شەڕێکە لەنێوان هێزی پێشمەرگەی تیپی ٥٩ی حەمرین و هێزەکانی عێراق لە ٢ی ئابی ساڵی (١٩٨٧) لە ناوچەی نێوان قادر کەرەم و دووزخورماتوو. بەپێی نەخشەیەك کەلێپرسراوانی تیپەکە لە کۆبوونەوەی گوندی عەلی مستەفا تاوتوێیان کردبوو، بڕیار درا بۆسەیەك لە شوێنێکی دیاریکراوی سنووری گوندی قەرەچێوار کە پێی دەوترێ بانەژریژەکە کە پێنج کیلۆ مەتر لە باشووری خۆر ئاوای قادر کەرەمەوەیە، بۆ هێزەکانی عێراق دابندرێ.

بەم پێیە هێزێکی زۆر لە بانەژریژەکە بەسەر پێنج بەشدا دابەشکرا: بەشی یەکەم بەدیوی قادر کەرەم بەسەرپەرشتیی یاسین بچکۆل، بەشی دووەم بەسەرپەرشتیی کەرتی یەك، بەشی سێیەم بەسەرپەرشتیی چالاك حاجی مەحمود، بەشی چوارەم بەسەرپەرشتیی هێمنە رەش فەرماندەی تیپی ٥٩ی حەمرین و لەتیف بنەیی، بەشی پێنجەم بەسەرپەرشتیی حاجی شەهاب و خەلیل جافانی.

بەپێی نەخشەکە، هێزێك بەسەرپەرشتیی سەلاح حەمە غەریب و مەدحەت قۆچلی بەچاوساغیی رەشید عەلی مستەفا چووە کانی شرینك کە چەند کیلۆ مەترێك لە بانەژریژەکەوە دوورە، بەمەبەستی لێدانی رەبییەیەکی هێزەکانی عێراق. هێزەکە ئەرکەکەی بەرێکوپێکی ئەنجام داو لەگەڵ دەستپێکردنی هێرش بۆ سەر رەبییەکە، هێزێکی گەورەی سوپای عێراق بەپەلەپڕوزێ لە قادر کەرەمەوە بۆ فریاکەوتنی رەبییەکەی کانی شرینك دەرچوو، زۆری نەبرد هێزەکە کەوتە بۆسەکەوەو پێشمەرگەکان دایانە بەر ئاگری چەکەکانیان. هەموو شەڕەکە ٤٥ خولەکی خایاندو دوژمن ئەم زیانانەی لێکەوت: کوژرانی زیاتر لە ٣٠ سەربازو جاش، لەوانە ئەفسەرێك بەپلەی کۆلۆنێل کەجێگری فەرماندەی لیواکەی قادر کەرەم بوو، بەدیل گرتنی ٢ سەربازو سووتانی ٤ کامیۆن. دەستکەوتەکان: گرتنی ١٦ پارچە چەك و ژمارەیەکی زۆر فیشەك و تەقەمەنی و نارنجۆك.

هێزی پێشمەرکە هیچ زیانی نەبوو. هەر ئەو رۆژە، هێزەکانی عێراق لە داخی زیانەکانیان دوو هەلیکۆپتەریان ناردە سەر گوندی عەلی مستەفا. هەلیکۆپتەرەکان گوندەکەیان دایە بەر دۆشکاو شەستیرو موشەك، لە ئاکامدا پێشمەرگە محێدین ئەحمەد محێدین و دوو هاووڵاتی کەیەکێکیان ژنە شەهید کران، چەند پێشمەرگەو هاووڵاتییەك بریندار بوون و تراکتۆرو چەند خانوویەکی گوندەکە گڕیان تێ بەر بوو.

*** رووداوی گوندی داری خلە:-**

رووداوی داتەپینی ئەشکەوتی خلە کەبووە هۆی شەهیدبوونی حەوت پێشمەرگەی پارتیزان. پاش قۆناغی ئەنفال و کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ سەر سنوور، یەکەم مەفرەزەی پارتیزان لە قەرەداغ و گەرمیان لەسەر دەستی مەلا ئەحمەد محەمەد حەمە ئەمین لە ساڵی (١٩٨٨) دامەزرا.

مەفرەزەکە تا شوباتی (١٩٨٩) لە ناوچەکەدا مابووەوە و بنکەیەکی نهێنیی لە ئەشکەوتی داری خلە دانابوو. لە ئێوارەی ١٩ی شوباتدا ئەشکەوتەکە بەسەر پێشمەرگەکاندا رووخاو بەو هۆیەوە ئەوانەی ناو ئەشکەوتەکە شەهید بوون.

پێشمەرگە پارتیزانەکان: مەلا ئەحمەد محەمەد حەمە ئەمین، نوری قادر رەحیم، دارا قادر سەمین، حەیدەر محەمەد کەریم، حەمید قادر کەریم، سەلام محەمەد حوسێن و رەحیم رەشید ئەحمەد.

لەم رووداوە تەنها دوو پێشمەرگە بەناوی سەید محەمەدو حەمە سوران رزگاریان بوو کە لەکاتی دارمانی ئەشکەوتەکەدا، لەسەر گرۆڵکەیەکی نزیك ئەشکەوتەکە خەریکی قسەکردن بوون بەدەزگای بێ سیم لەگەڵ بنکەکانی تردا. تەرمی شەهیدەکان بۆ ماوەی دوو ساڵ و حەوت مانگ لەناو ئەشکەوتەکە مایەوە. پاش راپەڕینی ساڵی (١٩٩١)، لە ٥ی تشرینی یەکەمدا تەرمەکان پاش لابردنی بەردەکان بە شۆفڵ، دەرهێنران و لەرێ و رەسمێکی شکۆمەندو شایستەدا بەخاك سپێردران.

ژیاننامەی شەهیدەکان

- ئەحمەد محەمەد حەمە ئەمین:

فەرماندەی تیپی ٥٥ی قەرەداغ و لێپرسراوی مەفرەزە پارتیزانەکانی قەرەداغ و گەرمیان لە ساڵی ١٩٨٨دا.

- نوری قادر رەحیم:

ناسراو بەپۆلا. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٧)ی گوندی نارێن لە قەزای کفری. ساڵی (١٩٨٤) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو ساڵی (١٩٨٦) لە تیپی ٥٣ی شێروانە بووەتە پێشمەرگە.

- حەیدەر محەمەد کەریم:

لەدایکبووی ساڵی (١٩٨٦)ی گوندی گردە رەشی سنووری ناحیەی پێباز. بەهۆی دەستکورتییەوە نەیتوانیوە بەردەوام بێ لەسەر خوێندن. ساڵی (١٩٨٤) پەیوەندیی بەکۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە. ساڵی (١٩٨٥) لە مەڵبەندی یەك بووەتە پێشمەرگە.

- رەحیم رەشید ئەحمەد:

لەدایکبووی ساڵی (١٩٧٠)ی گەرەکی کەلاری کۆن لەشارۆچکەی کەلار. ساڵی (١٩٧٤) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو ساڵی (١٩٨٨) بووەتە پێشمەرگە.

- حەمید قادر کەریم:

ناسراو بەحاجی حەمید. لەدایکبووی ساڵی (١٩٣٨)

ی گوندی قەرەبلاخی سنووری کەلار. لە ساڵانی (١٩٧٤ - ١٩٧٥) پێشمەرگە بووە. دوای هەرەسهێنانی شۆڕش لە ساڵی (١٩٧٥)، بەخۆی و خێزانییەوە بۆ باشووری عێراق دوورخراوەتەوە. ساڵی (١٩٧٦) پەیوەندەیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە. ساڵی (١٩٧٨) بووەتە پێشمەرگە.

- سەلام محەمەد حوسێن:

ناسراو بەسەلامە رەش. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٨) گوندی نارێن لە سنووری قەزای کفری. دەرچووی پۆلی سێیەمی ناوەندییە. ساڵی (١٩٨٤) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو لە تیپی ٥٥ی قەرەداغ بووەتە پێشمەرگە. لە شەڕی گڵەزەردە بریندار بووە.

- دارا قادر سەمین:

ناسراو بەدارا سوور. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٤) ی گوندی نارێن لەسنووری قەزای کفری. دەرچووی قۆناغی سەرەتاییە. ساڵی (١٩٨٣) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە. ساڵی (١٩٨٥) بووەتە پێشمەرگەی تیپی ٥٥ی قەرەداغ. ساڵی (١٩٨٧) کراوتە فەرماندەی مەفرەزە لە کەرتی ٣ی تیپەکە. لەکاتی شاڵاوی ئەنفالەکاندا لە شەڕی کلاو سپی بریندار بووە.

*** چالاکی گەراوی - تازەشار:-**

شەڕێکە لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزی سوپای عێراق لە گەرمەی شاڵاوی ئەنفالی سێی گەرمیان کە گەورەترین شاڵاوی ئەنفالەکان بوو. شاڵاوەکە لە ٧ی نیسانی ساڵی (١٩٨٨) دەستی پێکردو تا ٢٠ی نیسان درێژەی کێشاو تێیدا هێزەکانی سوپای عێراق لە ١٠ قۆڵەوە هێرشیان کرد. لە سێیەم رۆژی شاڵاوەکە، لە ٩ی نیسانی ساڵی (١٩٨٨) هێزێکی هاوبەشی پێشمەرگە کە لە تیپەکانی ٥١ی گەرمیان و ٥٧ی حەمرین و هێزی پشتگیری و بەتالیۆنی ٤ی گەرمیانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق پێکهاتبوو. کاتێك هێزەکانی عێراق روویان کردە هەر دوو گوندی گەراوی و تازەشار کە چەند کیلۆ مەترێك لە شارۆچکەی قادر کەرەمەوە دوورن، لەسەر رێگەی گەراوی - قەیتول بەرەنگاری هێزەکە بۆوە. پاش شەڕێکی سەخت، پێشمەرگە بۆ ناو گوندی گەراوی و تازەشار کشایەوە. هێزەکانی عێراق، بەپاڵپشتی تانك و زرێپۆش چەند هێرشێکی یەك لەدوای یەکیان کردە سەر هەردوو گوندو شەڕەکە زیاد لە ١٠ سەعاتی خایاند.

دوژمن زیانێکی زۆری لێکەوت، هێزی پێشمەرگەکەش ٣٥ شەهیدی هەبوو، لەوانە ٢٧ پێشمەرگە سەر بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوون و ٨ پێشمەرگە سەر بە پارتی کۆمۆنیستی عێراق بوون.

شەهیدەکانی یەکێتی ئەمانەن: ئیکرام محەمەد ئەمین سلێمان (ئیکرام چاوشین)، ئەیوب ئەحمەد ساڵح،حوسێن مەعروف محەمەد، ئەحمەد عەبدولرەحمان نامیق (ئەحمەد نازە)، ئیحسان مەحمود قادر ساڵح (ئیحسانە سوور)، جەبار عەبدولکەریم عەلی (جەبار کانی قادری)، ئەحمەد ئەمین رۆستەم (هەڤاڵ)، سامان مەجید خورشید (سامان کەرکوکی)، حەمید محەمەد ساڵح عەزیز، جەبار کەریم عەلی، فاروق رەشید بەلەگە، غالیب عەبدوڵڵا ئەمین (هونەر)، عەبدولواحید عەبدوڵڵا محەمەد، نازم رەشید بەلەگە (نازم بچکۆل)، عادل مەجید عەبدولکەریم (مام عادل)، کەریم حەمید ئاغای زەنگەنە (مەلا کەریم)، نیزام ئەحمەد رەمەزان، نەجم محەمەد محەمەد ئەمین، شێرزاد حەسەن عەلی عەبدوڵڵا (شێرزاد بەچە)، فاتیح حەسیب حوسێن (ئاسۆ)، نەجم رۆستەم عەلی (نەجم قەیتوەلی)، میران فەرەج عوبێد، محەمەد کەریم ئەحمەد ئیسماعیل (حەمە باوایی)، فەرهاد ئەنوەر شێخانی (فەرهاد بچکۆل)، یاسین سەعدون سەعید، نەجات فەتحوڵڵا مەحمود قادر، ئەحمەد قادر کەریم (ئاوارە).

شەهیدەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق ئەمانەن: عەبدولرەحیم عەلی محەمەد (ئاشتی)، نازم عەلی عەباس (سامی)، فەوزی هادی عەتوی (عامر)، تالیب ئیبراهیم کامیل (عەلی عارەب)، تاریق محەمەد ئەمین، بەهادین عەلی محەمەد (ماجید)، عەدنان رەشید غێدان (عەدنان کانی قادری)، عەبدوڵڵا والی حەیدەر (عەبدوڵڵای سووری).

*** ژیاننامەی هەندێ لە شەهیدەکانی:-**

- جەبار عەبدولکەریم عەلی:

ناسراو بە جەبار کانی قادری. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٤) ی گوندی کانی قادر لە ناوچەی گەرمیان. ساڵی (١٩٨٢) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کردووەو چالاکانە ئەرکەکانی ئەنجام داوە. پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردووە بەڵام لە سنووری کەرتی یەکی تیپی ٥١ی گەرمیان وەك ئەندامێکی هێزی پشتگیری چەکی هەڵگرتووە، لەدژی هێرشەکانی سوپای عێراق بەرگریی لەناوچەکە کردووە لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا بەشداریی لە چەندین شەڕو نەبەردا کردووە.

- جەلیل کەریم عەلی:

لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٨)ی گوندی بەکر باجەلانی سەر بەناحیەی قادر کەرەم. ساڵی (١٩٨٤) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کردووەو توانیویەتی رۆڵێکی بەرچاو لە گەشەپێدانی رێکخستندا بگێڕێ. ساڵی (١٩٨٥) لە سنووری کەرتی ٤ی جەباریی سەر بەتیپی ٥٧ی سەگرمە بووەتە پێشمەرگەی هێزی پشتگیری و ساڵی (١٩٨٧) پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە کردەوە لە تیپی ٥٩ی حەمرین ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکردەوە. لەو ماوەیەدا لە چەندین نەبەردو شەڕدا بەشدار بووە.

- حوسێن مەعروف محەمەد:

لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٦)ی گوندی بەکر باجەلانی سەر بەناحیەی قادر کەرەم لە گەرمیان. ساڵی (١٩٨٢) پەیوەندیی بەرێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانی کوردستانەوە کردووەو ساڵی (١٩٨٤) بووەتە پێشمەرگە لە کەرتی ٥ی باسەرەی سەر بە تیپی ٥٧ی سەگرمە، دواتر بۆ کەرتی ٥ی شەهیدانی سەر بەتیپی ٥٩ی حەمرین گوازراوەتەوە. بەشداریی چەندین نەبەردی کردووەو دوو جار بریندار بووە.

- سامان مەجید خورشید:

ناسراو بە سامان كەركوكی. لەدایكبووی ساڵی (١٩٦٦)ی گەڕەكی شۆڕیجەی شاری كەركوك. ساڵی (١٩٨٢) پەیوەندیی بەرێكخستنەكانی كۆمەڵەی رەنجدەرانی كوردستانەوە كردو هەر ئەو ساڵە بوو بەپێشمەرگە لە كەرتی یەكی تیپی ٥١ی گەرمیان. لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشدار بوو لە چەندین شەڕو چالاكیدا.

- حەمید محەمەد ساڵح عەزیز:

ناسراو بە مامۆستا حەمید. لەدایكبووی ساڵی (١٩٦٨)ی گوندی یەنگیجەی سەر بە داقوق لە پارێزگای كەركوك. ساڵی (١٩٨٤) پەیوەندیی بەرێكخستنەكانەوە كردووەو ساڵی (١٩٨٦) ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێكردووە، لە كەرتی یەكی تیپی ٥١ی گەرمیان بووە بە پێشمەرگەو بەشداریی چەندین شەڕی كردووە.

- غالیب عەبدوڵڵا ئەمین:

ناسراو بە هێمن. لەدایكبووی ساڵی (١٩٦٣)ی خورماتوو. ساڵی (١٩٨٣) پەیوەندیی بەرێكخستنەكانی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستانەوە كردووە. ساڵی (١٩٨٦) پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە كردووەو لە كەرتی یەكی تیپی ٥١ی گەرمیان ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێكردووە. بەهۆی ئازایەتی و لێهاتووییەوە بووە بە فەرماندەی مەفرەزە.

- عەبدولواحید عەبدوڵڵا محەمەد:

لەدایكبووی ساڵی (١٩٦٠)ی گەڕەكی ئەحمەد ئاغای شاری كەركوك. هەر سێ قۆناغی خوێندنی لە كەركوك و ساڵی (١٩٨٤) خوێندنی زانكۆی لە هەولێر تەواو كردووە. مێژووی پەیوەندی كردنی بەرێكخستنەكانی كۆمەڵەی رەنجدەرانی كوردستانەوە بۆ ساڵی (١٩٨٣) دەگەڕێتەوە. ساڵی (١٩٨٥) پەیوەندیی بە شۆڕشەوە كردو لە گوندی قەیتولی سەر بە ناحیەی قادر كەرەم بووە بە مامۆستای شۆڕش.

- نازم رەشید بەلەگە:

ناسراو بە نازم بچكۆل. لەدایكبووی ساڵی (١٩٥٧)ی گوندی بەلەگە. ساڵی (١٩٧٦) پەیوەندیی بەرێكخستنەكانی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستانەوە كردووەو ساڵی (١٩٧٨) بووەتە پێشمەرگە لە هەرێمی ٥ی قەرەداغ. پاش پێكهێنانی تیپەكان لە ساڵی (١٩٨٢)، بووەتە فەرماندەی كەرتی یەكی سەر بەتیپی ٥١ی گەرمیان. لەژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی چەندین شەڕو نەبەردی كردووە.

- عادل مەجید عەبدولكەریم:

ناسراو بە مام عادل. لەدایكبووی ساڵی (١٩٤٨)ی گوندی تازە شار لە ناوچەی قادر كەرەم. ساڵی (١٩٧٩) پەیوەندیی بەرێكخستنەكانی كۆمەڵەی رەنجدەرانی كوردستانەوە كردووەو ساڵی (١٩٨٦) بووەتە پێشمەرگە لە كەرتی یەكی تیپی ٥١ی گەرمیان.

- كەریم حەمید ئاغای زەنگەنە:

ناسراو بە مەلا كەریم. لەدایكبووی ساڵی (١٩٥٨)ی گوندی تەپە عەلی لە ناوچەی زەنگابادی سەر بە كفری. هەر لەوێش خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی تەواو كردووەو دواتر چووە بۆ خانەی مامۆستایانی سلێمانی. ساڵی (١٩٨٠) لە كفری پەیوەندیی بەرێكخستنەكانی كۆمەڵەی رەنجدەرانی كوردستانەوە كرد. لەرێكخراوی هەردە كاری كردو بەهۆی لێهاتوویی و كارامەییەوە بووە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبردنی رێكخراوەكەو ماوەیەكیش سەرپەرشتیی كرد. ساڵی (١٩٨٢) پەیوەندیی بەهێزی پێشمەرگەوە كردو لە تیپی ٥١ی گەرمیان پێشمەرگایەتیی كرد. دواتر گوێزرایەوە بۆ تیپی ٥٩ی حەمرین و لەوێ هەم وەك كادرێكی رێكخستن كاری كرد هەم وەك لێپرسراوی گومرگ. لەو ماوەیەدا توانی پەیوەندییەكی بەهێز لەگەڵ جەماوەری ناوچەكەدا دروست بكا، لەسەگرمەوە تا زەنگاباد. لەژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی لەچەندین نەبەردو شەڕدا كردووە وەك گرتنی قادر كەرەم و سەنگاوو شەڕەكانی قەڵا مكایل و شاوك.

- نیزام ئەحمەد رەمەزان:

لەدایكبووی ساڵی (١٩٦٢)ی خورماتوو. ساڵی (١٩٨١) پەیوەندیی بەرێكخستنەكانی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستانەوە كردووەو پاش دوو ساڵ بووەتە پێشمەرگە لە كەرتی یەكی تیپی ٥١ی گەرمیان. لەبەر ئازایی و لێهاتوویی، كرا بە فەرماندەی مەفرەزە. لەژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشدار بوو لە چەندەها شەڕو چالاكی.

- شێرزاد حەسەن عەلی عەبدوڵڵا:

ناسراو بە شێرزاد بەچە. لەدایكبووی ساڵی (١٩٧٠)ی گوندی توم پەڵك لە گەرمیان. ساڵی (١٩٨٦) پەیوەندیی بەرێكخستنەكانی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستانەوە كردووەو هەمان ساڵ بووەتە پێشمەرگە لە كەرتی یەكی تیپی ٥١ی گەرمیان. لەژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی چەندین شەڕو چالاكیی كردووە.

- فاتیح حەسیب حوسێن:

ناسراو بە ئاسۆ. لەدایكبووی ساڵی (١٩٧٢)ی شاری كەركوك. تا پۆلی دووی ناوەندیی خوێندووە. لە ١٥ی نیسانی ساڵی (١٩٨٦) لە كەركوك پەیوەندیی بەرێكخستنەكانی كۆمەڵەی رەنجدەرانی كوردستانەوە كردووەو لە سەرەتای ساڵی (١٩٨٧)دا بووە بە پێشمەرگە لە تیپی ٥٩ی حەمرین. لەژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشدار بووە لە بەشێكی زۆری شەڕو نەبەردەكانی تیپەكەی و جارێكیش بریندار بووە.

- نەجم رۆستەم عەلی:

ناسراو بە نەجم قەیتەوەلی. لەدایكبووی ساڵی (١٩٧٠)ی شاری كەركوك. ساڵی (١٩٨٢) پەیوەندیی بەرێكخستنەكانی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستانەوە كردووەو ساڵی (١٩٨٥) بووەتە پێشمەرگە لە كەرتی ٥ی باسەرەی سەر بەتیپی ٥٧ی سەگرمە، پاشان بۆ تیپی ٥٩ی حەمرین گوێزراوەتەوە. لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی چەندین شەڕو نەبەردی گەورەی كردووە.

- فەرهاد ئەنوەر شێخانی:

ناسراو بە فەرهاد بچكۆل. لەدایكبووی ساڵی (١٩٦٨)ی گەڕەكی شۆڕیجەی شاری كەركوك. ساڵی (١٩٨٤) پەیوەندیی بەرێكخستنەكانی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستانەوە كردووەو پاش دوو ساڵ بووەتە پێشمەرگە لە تیپی ٥٩ی حەمرین. لە ماوەی پێشمەرگایەتیدا ئەركەكانی سەر شانی

بەرێکۆپێکی جێبەجێ کردووە، بەشداریی شەڕو نەبەردا کردووەو جارێکیش بریندار بووە.

- یاسین سەعدون سەعید:

لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٦)ی دووزخورماتوو. مێژووی پەیوەندی کردنی بەڕێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە بۆ ساڵی (١٩٨٥) دەگەڕێتەوە. هەر ئەو ساڵە ژیانی پێشمەرگایەتیی دەستپێکردووەو لە کەرتی یەکی تیپی ٥١ی گەرمیان بووەتە پێشمەرگە. بەهۆی کارامەییو لێوەشاوەییەوە، کراوە بەفەرماندەی مەفرەزە. لەژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی ژمارەیەکی زۆری چالاکییەکانی تیپەکەی کردووە.

- نەجات فەتحوڵڵا مەحمود قادر:

ناسراو بە مامۆستا نەجات. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٤)ی گوندی حەفتەغار لە گەرمیان. ساڵی (١٩٨٢) پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردووەو ساڵی (١٩٨٤) بووەتە پێشمەرگە لە کەرتی یەکی تیپی ٥١ی گەرمیان لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی دەیان چالاکیی کردووە.

- ئەحمەد عەبدولرەحمان نامیق:

ناسراو بە ئەحمەد نازە. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٧) ی گوندی برایم غولام لە ناحیەی قادر کەرەم. مێژووی پەیوەندی کردنی بەڕێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە بۆ ساڵی (١٩٨٥) دەگەڕێتەوەو هەر ئەو ساڵە بووە بە پێشمەرگە لە کەرتی ٢ی تیپی ٥١ی گەرمیان. دواتر بۆ تیپی ٥٩ی حەمرین گوازراوەتەوە. لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی ژمارەیەکی زۆری چالاکییەکانی هەردوو تیپی ٥١ی گەرمیانو ٥٩ی حەمرینی کردووە.

- ئیحسان مەحمود قادر ساڵح:

ناسراو بە ئیحسانە سوور. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٧) ی گوندی کانی قادری سەر بەناحیەی قادر کەرەم. ساڵی (١٩٨٣) پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کردووەو هەر ئەو ساڵەش بووەتە پێشمەرگە لە کەرتی یەکی تیپی ٥١ی گەرمیان. لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشدار بوو لە چەندین شەڕو داستانو دوا پلەی فەرماندەی مەفرەزە بوو.

- ئیکرام محەمەد ئەمین سلێمان.

ناسراو بەئیکرام چاوشین. لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٦) ی گوندی هەرمۆڵەی سەر بەناحیەی قادر کەرەم. ساڵی (١٩٨٠) پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کردووەو ساڵی (١٩٨٣) بووە بە پێشمەرگە لە کەرتی ٢ی تیپی ٥١ی گەرمیان. بەهۆی ئازایەتییەوە، ساڵی (١٩٨٦) بووە بە فەرماندەی مەفرەزە لە هەمان کەرت. لەژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداریی چەندین شەڕی کردووەو ٣ جار بریندار بووە. سێیەم شەهیدی بنەماڵەکەیەتی.

- نەجم محەمەد محەمەد ئەمین:

ناسراو بە نەجم سەنگاوی. لەدایکبووی ساڵی (١٩٧٢) ی گوندی باخە گردەی سەر بەناحیەی سەنگاو. ساڵی (١٩٨٦) پەیوەندیی بەڕێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کردووەو بۆ ساڵی پاشتر بووەتە پێشمەرگە لە تیپی ٥٧ی سەگرمە پاشان بووەتە تیپی ٥١ی گەرمیان گوێزراوەتەوە لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا لە چالاکییەکانی هەردوو تیپی ٥٧ی سەگرمەو ٥١ی گەرمیاندا بەشدار بووە.

- ئەیوب ئەحمەد ساڵح:

لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٨)ی گوندی قایتەوەنی سەر بەناحیەی قادر کەرەم. مێژووی پەیوەندی کردنی بەڕێکخستنەکانی یەکێتی نیشتمانیی کوردستانەوە بۆ ساڵی (١٩٨٣) دەگەڕێتەوە. پاش ساڵێك لە پەیوەندی کردنی بەیەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە، روی لەژیانی پێشمەرگایەتی کردو لە کەرتی یەکی تیپی ٥١ی گەرمیان بوو بە پێشمەرگە. دواتر بۆ کەرتی ٣ی شەهیدانی سەر تیپی ٥٧ی سەگرمە گواسترایەوە. لەژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشدار بووە لەزۆربەی شەڕو چالاکییەکانی تیپی ٥٧ی سەگرمەو لە هەموویاندا رۆڵی پێشمەرگەیەکی نمونەی پیشانداوە.

*** چالاکی گوندی گەورەدێ:-**

شەڕێکی سەردەمی شاڵاوی ئەنفالەکانە لەنێوان هێزی پێشمەرگەی کەرتەکانی ١و ٢و ٣ی تیپی ٢٣ی سووورداشو هێزەکانی سوپای عێراق لە دەروبەری گوندی گەورەدێ لە ناوچەی ئاغجەلەر.

لە ٣ی ئایاری ساڵی (١٩٨٨)دا هێزێکی گەورەی دوژمن کە پێهاتبوو لە فەوجە سووکەکانو مەفرەزە تایبەتەکانی کۆماندۆ، لە دەربەندی بازیانەوە بەرەو ناوچەی ئاغجەلەر بەرێ کەوتن. ئەو هێزە لەنێوان گەورەدێو کانی بی کەوتە ناو بۆسەی پێشمەرگەوەو پاش شەڕێکی ٣ سەعاتی، بەبێ ئەوەی هیچ ئامانجێکی بەدی بێنێ، پاشەکشەی کرد.

رۆژی پاشتر، هێزێکی بەربڵاوتری سوپای عێراق بەپشتیوانی فەوجە سووکەکانو زیاتر لە ١٠ تانك هەڵکشایە سەر گەورەدێ. سەعات ٨،٣٠ پێشمەرگەکان روبەروی هێزەکە بوونەوەو شەڕێکی دەستەویەخەیان لەگەڵدا کردو هەر لەوێ ٥ جاشو ٤ سەرباز کوژران. لەبەر نابەرابەریی تەرازوی هێز، پێشمەرگەکان کشانەوە بۆ ناو دێ. بەڵام لەگەڵ کشانەوەی پێشمەرگە بۆ ناو دێ، چوار هەلیکۆپتەری جەنگی بەخەستی کەوتنە بۆردومان کردنی گوندەکە. لەو سۆنگەیەوە کە هێرشەکەی دوژمن سەرتاسەری ناوچەکەی گرتبووە، زۆری نەبرد پێشمەرگانی کەرتی یەك بە فەرماندەیی سابیر کۆکەییو کەرتی دوو بە فەرماندەیی کەریم ئاغجەلەری لە بەرەکانی تر کشانەوەو خۆیان گەیاندە گەورەدێ. لێرە بەدواوە، سەرباری بۆردومانی چوار هەلیکۆپتەرە جەنگییەکە، تۆپخانەی عێراق لە سوسێو دەربەندی بازیانەوە کەوتە تۆپباران کردنی گوندەکە.

دوا بەدوای بۆردومانەکان، هێزەکانی دوژمن هێرشێکی بەربڵاویان کردە سەر گوندەکەو لەم هێرشەدا چەندین سەربازو جاشیان لێ کوژرا. هێزی پێشمەرگەش دوو شەهیدی هەبوو کە بریتی بوون لە عومەر شیلەخانیو کامەران رەحمان تەها کەرکوکی. لە سەعات ١٣ هێزی پێشمەرگە بەرەو چەمی رەزان پاشەکشەی کردو لەوێوە پێشمەرگەکانی کەرتی یەكو

کەرتی دوو گەمارۆی دوژمنیان شکاندو خۆیان گەیاندە چیای پیرەمەگرون بەلام کەرتەکەی تر نەهامەتییەکی زۆرتری بینی و پاش دوو رۆژ ئینجا گەیشتە سەر سنوور.
گەورەدێ: یەکێکە لە گوندە گەورەکانی ناوچەی ئاغجەلەر، لەشوێنێکی بەرزدا دروست کراوە کە دەروانێتە سەر هەر سێ ناوچەی قەلا سێوکەو بازیان و سووورداش و لەم سۆنگەیەوە لە ڕوی عەسکەرییەوە هەلکەوتێکی ستراتیجیی گرنگی هەیە. لەکاتی شالاوی ئەنفالەکاندا بارەگای کەرتی ٣ی تیپی ٢٣ی سووورداشی لێ بوو.

* چالاکی چەمی تولکی:-
شەرێکی دوای قۆناغی ئەنفالەکانە، لەچەمی تولکی لە ناوچەی شێخ بزێنیی خواروو لەنێوان مەفرەزەیەکی پارتیزان بە فەرماندەیی سیروان کویخا نەجم و هێزەکانی عێراق.
لە ١٧ی ئەیلولی سالی (١٩٨٨) هێزێکی سەربازو جاش کە ئەرکی کێومال کردنی ناوچەی قەدەغەکراوی پێ سپێردرابوو، گەمارۆی مەفرەزەیەکی پارتیزانی دا لە چەمی تولکی. ئەو شوێنەی پێشمەرگەکانی لێ گەمارۆ درا، شێوەی دوورگەی هەیە چوونکە گردێکە لە ناوەراستی زێی بچووك لە بەردەم گوندی تولکی. جگە لە پێشمەرگە، دوورگەکە چەند کەسووکارێکی پێشمەرگەی لێ بوو کەبۆ سەردان هاتبوون. لەو روانگەیەوە کە عێراق ناوچەکەی بەناوچەی قەدەغەکراو دانابوو، هەرچی لەوێ دەبینرا، تەقەی لێ دەکراو جیاوازی لەنێوان چەکدارو سیڤیل نەدەکرا. ژمارەی گەمارۆدراوەکان ٣٥ کەس بوو، یانزەیان پێشمەرگە بوون و ٢٤یش هاوولاتیی سیڤیل بوون، لەوانە ٣ ژنی تێدا بوو.
پێشمەرگەکان خۆیان بۆ بەرگری ئامادە کردو کەوتنە چال هەلکەندن و هەموو چالەکانیشیان بەدارو گەلا داپۆشی و خۆیان تێدا شاردەوەو هەر کە هێزەکانی دوژمن لێیان نزیك بوونەوە، لێیان هاتنە دەست و تەقەیان لێکردن. شەر سەعات ٩:٣٠ دەستی پێکرد. تا سەعات ١٩:٣٠ هێزەکانی دوژمن هەشت هێرشیان کرد بەبێ ئەوەی بتوانن دەست بەسەر دوورگەکەدا بگرن. دوژمن هەر بەهێرش کردن دانەکەوت، بەلکو پێش هەر هێرشێك هەلیکۆپتەری جەنگی دوورگەکەی بەشەستیر بۆردومان دەکرد یان دوورگەکە دەدرایە بەر هاوەن. کەتاریك داهات، هێرشەکان راگیران، بەلام هێزەکان نەکشانەوەو وایان دانابوو کە بەیانییەکەی هێرشەکانیان دەست پێ بکەنەوە بۆ لەناوبردنی گەمارۆدراوەکان. لە تاریکیداو بەسوود وەرگرتن لە شارەزایی پێشمەرگە. گەمارۆدراوەکان بەناو زەلکاوێکی قامیشەلاندا ڕێگایەکی دەربازبوونیان لەنێوان تولکی و قەرە سالم بری.
لەم شەرەدا دوژمن ئەفسەرێك و ١٤ سەربازو یەك جاشی لێ کوژرا. هێزی پێشمەرگەش دوو شەهیدی هەبوو کە بریتین لە نەجات عەبدوللا کۆچەکی و موشعان بۆلی باریجەیی، لە هاوولاتییانی سیڤیلیش دوو شەهید هەبوو، یەکێکیان ژنە، سەرباری پێنج برینداری پێشمەرگەو سیڤیل.
ناوی پێشمەرگەکانی بەشدار لەم شەرە (بەدوو شەهیدەکەوە): سیروان کویخا نەجم، رەنجە عومەر سدیق، جوتیار، نەجات عەبدوللا کۆچەکی، عومەر چاوشین کۆچەکی، جەمال حوسێن میرزا، ئەحمەد عومەر جەوە جەوە، محەمەد تیژەیی، تالیب فاروق، موشعان بۆلی باریجەیی، ئەکرەم عەزیز مەلا ئاواری.
چەمی تولکی یان دوورگەی تولکی: کەوتووەتە سەر زێی بچووك لە بەردەم گوندی تولکی لە ناوچەی شێخ بزێنیی خواروو، لەنێوان تەقتەق و ئالتون کۆپری. گردێکە شێوەی دوورگەی هەیەو هەر چوار دەوری ئاوە، زۆربەی زۆری دارستانە، بەلام ناوەراستەکەی بێ دارو دەرەختەو زۆرتری لمە.

* چالاکی چەمی ڕێزان:-
شەرێکە لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزکانی عێراق لەناوچەی چەمی ڕێزان لە سالی (١٩٨٨). هێزەکانی عێراق لە ٦ی تەموزی (١٩٨٨)دا لەسێ قولەوە هێرشیان کردە سەر گوندەکانی چەمی ڕێزان و کەلەشێرەو سووورقاوشان بەلام ئامانجی سەرەکیی هێرشەکە قولی کەلەشێرە - کانی شێخ بوو کە پێشمەرگەکانی کەرتی شەهید کاوەی سەر بەتیپی ٢٥ی خالخالان خۆیان تێدا قایم کردبوو.
لەگەل درێژەکێشانی شەرەکەدا، تیپی ٢٣ی سووورداش و مەفرەزەیەکی مەکتەبی عەسکەری گەیشتنە شوێنی شەرەکەو گوشاری زۆرتریان خستە سەر هێزەکانی عێراق.
شەر لەسەعات ١٥وە تا سەعات ٢٠ بەردەوام بوو. هێزەکانی عێراقلەنێوان ٤٠ تا ٥٠ کوژراوو ژمارەیەکی زۆر برینداریان لێکەوت و ٧ سەربازیشیان لێ بەدیل گیرا.
دەستکەوتی هێزی پێشمەرگە ١١ کلاشنکۆف و برێك تەقەمەنی بوو. هێزی پێشمەرگە هیچ زیانێکی نەبوو.

* چالاکی گوندی خالە بەگ:-
چالاکییەکی پێشمەرگە پارتیزانەکانە لە سالی (١٩٨٩) لە ناوچەی شێروانە. مەفرەزەیەکی جاش لەلایەن دەزگای هەوالگریی سوپای عێراقەوە بۆ گەران بەدوای دەستە پارتیزانەکاندا نێردرابوە ناوچەی شێروانە.
لە (٧ی ئایاری سالی ١٩٨٩) لە سەعات ٣٠، ٤ی بەیانیدا جاشەکان لە نزیك گوندی کاولکراوی خالە بەگ کەوتنە بۆسەی پێشمەرگە پارتیزانەکان و درانە بەر ڕێژنەی گوللەو دوو جاشیان لێ کوژرا کەیەکێکیان خەلکی گوندی کەلەشێرەو سەردەستەی سەر بەیەکەی ژمارەی (١٣٤٦٣)بوو، ئەوی تر خەلکی گوندی کاولکراوی مێوەکەو سەر بەهەمان یەکە بوو.

* چالاکی گوندی دەرەی نەوتەکە:-
چالاکییەکی هێزی پێشمەرگەیە لەسەر ڕێگای سلێمان بەگ - کفری لە سالی (١٩٨٩). سەعات ٣٠، ١٩ی رۆژی ١٨ی کانوونی دووەمی سالی (١٩٨٩) پێشمەرگەکانی کەرتی ٦ی تیپی ٥١ گەرمیانی سەر بەرەتلی پارتیزانەکانی دەشتی گەرمیان لەسەر ڕێگای سلێمان بەگ - کفری چوونە سەر رەبییەی دەرەی نەوتەکە، بە چەکی سووك و ئارپیجی لێیانداو رەبییەکەیان بەسەر سەربازەکاندا رووخاند.
لەم سەروبەندەدا هێزێکی سوپا بە چەند ئیڤاو زرێپوشێك

بۆ فریاکەوتنی رەبییەکە لە سلێمان بەگەوە بەرەو شوێنی چالاکییەکە بەڕێ کەوتن. پێشمەرگەکان لە هێزەکە هاتنە دەستو ناچاریان کرد بکشێتەوە دواوە. زیانی دوژمن نەزانراوە.

* چالاکی گوندی پەڵکانە :-

چالاکییەکی پێشمەرگەکانی کەرتی ٦ی تیپی ٥١ی گەرمیانی سەر بە بەرەتلی پارتیزانەکانی دەشتی گەرمیانە لەسەر رێگای دووزخوماتوو – بەغدا. لە ١٨ی کانونی دووەمی ساڵی (١٩٨٩) پێشمەرگەکانی کەرتی ٦ی تیپی ٥١ی گەرمیان، لە چوارچێوەی هەڵسوورانی هێزە پارتیزانەکاندا، هەڵیان کوتایە سەر رەبییەی پەلکانە کە لەسەر رێگای دووزخورماتوو – بەغدا ئەرکی پاراستنی بارەگای فەوجی دووزخورماتوی سوپای عێراقی پێ سپێردرابوو. پێشمەرگەکان بۆ ماوەی دوو سەعات بە کلاشنکۆفو ئارپیجی رەبییەکەیان کوتا. هێرشەکە بووە مایەی گرتێبەربوونی بەشێکی رەبییەکە. زیانی ناو رەبییەکە نەزانراوە.

ئەم چالاکییە بەوەی کە لەسەر رێگای ستراتیجیی کەرکوك – بەغدا ئەنجام دراوە، دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو – میدیاکانی یەکێتیی لە ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستانو رۆژنامەی کوردی زوبانی (رێبازی نوێ)و رۆژنامەی عەرەبی زوبانی (شەرارە) بایەخێکی شایستەیان پێداوە. رۆژنامەی (رێبازی نوێ) لەو ژمارەیەی کە هەواڵەکەی تێدا بلاوکراوەتەوە، هەواڵی چالاکییەکەی کردۆتە مانشێتو بەشێوەی (هێزی پێشمەرگە لە نزیك جادەی بەغدا لە دوژمن رادەپەڕێ) سەرنجی بەلادا راکێشاوەو لەناواخنیشدا لە لاپەرەی ١٨دا لەژێر ناونیشانی (هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەسەر جادەی دووز – بەغدا زەبر لە دوژمن دەدات) هەواڵی چالاکییەکەو چەند چالاکییەکی تری بلاوکردووەتەوە.

*** ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ لە کەرکوک و دەوروبەری**

**مەلا شاخی**

هێشتا با هۆزی ڕاپەڕین نەگەیشتبووە سنووری پارێزگای کەرکوک، کاربەدەستانی ڕژێم کەوتنە دارشتنی بەرنامەی تایبەتی بۆ پارێزگاری کردنی دوورخستنی مەترسییەکانی. بووەتەو مەبەستە بڕیاریان دابوو خەڵکێکی زۆر بە بارمتە بگرن.. گوایە بەو کارەیان دەتوانن کەرکوک لە بازنەکە دەرکەن.

شەوی نۆو دە و یانزەی ئاداری ساڵی (١٩٩١) بەهۆی هێزەکانی سوپاو (القوة المشترکة) چواردەوری هەموو گەرەکە کوردنشینەکانی (کەرکوک)و (دووبز) یان گەمارۆدا بە هەزاران کەسیان لە پیرو لاو لە شیرن خەو هەڵساندو ڕاپێچی زیندانیان کردن، بۆ ڕۆژانی دواتر هەر هەموویان گواستەوە بۆ (تکریت)و (ڕوومادی) بەشێوەی سەردەمی ئەنفال هەڵسوکەتیان لەگەڵدا کردبوون. لە چەندین هۆڵی گەورە گەورەدا دەرگاکانیان لێ کلۆم کردبوون.

لە ڕۆژی ٢٨ی ئادار بەشێکی گەورەی ئەو خەڵکە گیراوەیان گواستەوە بۆ (ڕوومادی)، بەشێکی کەمی ئەو خەڵکانە کە دوور خرانەوە لە ڕێگادا ڕایانکردو خۆیان دەربازکرد. بەشێکی تر لە (٣)ی نیسان بەرەو زیندانی (ڕوومادی) بە ڕێکران، کە هەر لەو زیندانە بەندکراوە کوێتییەکانیشی تێدا بوو کە لە دوایدا سەرەونگوم کران.

خەڵکی کفری زۆربەی لەو بڕوایەدا نەبوون کە حکومەتی بەعس بەم هەموو هێزەو بەم ئاسانییە دەست لە شارێك هەڵبگرێت کە ساڵەهای ساڵە حوکمی تێدا دەکات.

یەکەم کەس ئەو کاتە ئەبو کاروانی حیزبی شیوعی عێراقی بوو کە بە هوتاف لێدان چووە سەربانی مونەزەمەی حیزبی بەعس کفری و هوتافی شۆڕشی لێدا لە کفری دواتر مەفرەزەکانی پێشمەرگە چەکیان بەسەر خەڵکیدا دابەشکردوو شاریان خرۆشاند.

لە ڕۆژی (١٣)ی ئادارەوە تا ٥ی نیسان هێرشی ڕژێمی بەعس بە پاڵپشتی موجاهیدینی خەلقی ئێران بە هەموو جۆرە چەکێکی قوورس و سووک و دەبابەو ڕاجیمەو تۆپ و دۆشکا بەردەوام بوو تا شەوی کشانەوە لە کفری بە تەواوەتی لە پێنج لەسەر شەشی نیسانی ساڵی ١٩٩١ پێشمەرگە بەردەوام لە شەڕدا بوو.

هەمان ساڵ خەڵکی خورماتوو بە هاوشانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، مانگی ئاداریان کردە مانگی ئازادی و بەرگی زەماوەندی ڕاپەڕینیان پۆشی.

یانزە ڕۆژ قارەمانێتی و خۆڕاگری خەڵکی خورماتووو تۆمارکردنی گەورەترین داستانی سەردەم بە خوێنی (٣٦٠) شەهیدو بریندار لە پێشمەرگەو هاووڵاتیان ئەو سەرکەوتنەیان بەدەستهێنا.

لەدوای ڕزگارکردنی شاری کفری لە بەرواری (٣٠)ی ئاداری ساڵی (١٩٩١) بەسەرپەرشتی شەهید (حەمە ڕەش) دواتر ئەو هێزەی کە شاری کفری ڕزگار کرد بەرەو خورماتوو بە ڕێکەوتن و پەیوەندییان کر بە بە مەفرەزەکەی عوسمانی حاجی مەحمود کە سەرپەرشتی قۆڵی دووزی دەکرد لە کاتژمێری سێ عەسر لەو ڕۆژەدا چەکدارەکان و پێشمەرگەو ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشار تێکەڵبوون و لەگەڵ خەڵکی چەوساوەی خورماتوو هەڵسان بە لێدانی نیشانەکانی دامودەزگاکانی درندەی بەعس و هەر لە ئەمن و مەقەر حیزب و ئیستخبارات، نەیانتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن، بۆیە کۆمەڵ بە کۆمەڵ خۆیاندا بەدەستەوە.

بەڵام گەورەترین کۆسپ دروست بوو لەبەرامبەر هێزی پێشمەرگە، هێزی چەکداری (موجاهیدینی خەلق) بوو کە بارەگاکانیان لە نەوجوول بوو لە باکووری ڕۆژئاوای شارەکە. دوای ڕزگارکردنی خورماتوو بارگاکەیان چۆڵکردو بەرەو باشووری بەغدا بە ڕێکەوتن لە سەر شەقامی سەرەکی کە دەکەوێتە ناوەڕاستی شارەکە. زانیبیان شار ڕزگارکراوە نوێنەرێکیان لە خۆیان نارد بۆلای هێزی پێشمەرگە داوای ئەوەیان کرد کە دەکشێنەوە بۆ سەربازگەکەیان بۆ (عوزیم) نزیك شارۆچکەی خالیدیە، بەڵام دوای پەڕینەوەیان لە پردەکەی (ئاوەسپی) هەڵسان بە تۆپ بارانی خەڵکی شارەکە بە گولە هاوەن و بە هەموو جۆرە چەکێك و لە ناحیەی سلێمان بەگ نیشتەجێبوون.

ئەم کارەی هێزەکانی موجاهیدینی خەلق وایکرد کە ڕژێمی بەعس دووبارە خۆی کۆبکاتەوە، لەبەر چەند هۆکارێکی ستراتیژی شارەکە، کە چەند ڕێگایەکی سەرەکی دەیبەستەوە بە تکریت و کەرکوک و دیالەو بەغدا لە هەموو سنوورەکانەوە. ڕژێمی بەعس بە پەلە هێزێکی گەورەی دروستکرد بە سەرکردایەتی (بارق حاجی حەنك)

لەم شەڕەدا بەعس بەهەموو قورسایی خۆی بە شداربوو لە دژی شارەکە لەگەڵ موجاهیدینی خەلق کە شەر بۆ ماوەی نۆ ڕۆژ لەنێوان خەڵك و هێزی بەعس بەردەوام بوو بەدەیان پێشمەرگە بوونە قوربانی کە نموونەیان بریتی بوو لە:- شەهید حەمەڕەش، سوڵتان حەمید، ساڵح محەمەد حوسێن (کاکە)، نادر مەجید جوامێر، ئەحمەد زەردوای شوکر قەڵایی، ئازاد ڕەشید، ڕەمزی حوسێنی، کەماڵ سابی قازی، کەریم خەلیل، لەوشەڕەدا نزیکەی (٣٩٠) کەس بێ تاوان شەهید بوون، لەناویاندا منداڵ و گەورەو بچووك، ئەویش بەهۆی ئەو تۆپبارانە کوێرانەی فرۆکەخانەی (حلێوە) بە دووری (١٥) کیلۆمەتر لە خۆرئاوای شارەکەوە.

شار بۆ چەند قۆڵێکی بەرگری دابەشکرابوو بەم شێوەیە:-

١- ڕێگای تکریت کە دەکەوێتە خۆرئاوای شارەکە بە سەرپەرشتی تەیب برای شەهید سوارە.

٢- ڕێگای بەغدا لە باشووری شارەکە بە سەرپەرشتی شەهید مەجید دووزی و جەبار مەلا عەلی.

٣- قۆڵی مەشروعەکە لە سایلۆ کەوە بە سەرپەرشتی (حەمە ئەفە).

٤- ڕێگای کەرکوك کە دەکەوێتە باکووری شارەکەوە بە سەرپەرشتی (مەلا سەعید ئەحمەد).

٥- قۆڵی چیای هەنجیرە بەسەرپەرشتی مولازم عەباس و حەمە دووزی.

٦- قۆڵی خوێکە بە سەرپەرشتی شەهید (سوڵتان حەمید).
دوا بە دوای ئەوە ڕێکخستنەکانی ناو شار پەیوەندییان کرد بەچەند ئامر سریەی جاش و چەکدارەکانەوە بۆ پەیوەندی و هاوکاری پێشمەرگە، بۆیە بەشێکی زۆریان خۆیان تەسلیم کردو ڕۆڵیان بینی لە ڕزگارکردنی شوێنەکاندا.
لە (١١) ئاداری ساڵی (١٩٩١) پۆلێك لە جەماوەری ڕاپەڕیوی ناوچەی کەلارو کفری بەرەو سنووری خوورماتوو هاتن بۆ پشتیوانی لە نزیك (سلێمان بەگ) تووشی هێزەکانی موجاهدینی خەڵقی ئێرانی بوون، ئەوان بە دەبابەو زێپۆش، لە ئەنجامدا هەر هەموویان شەهید بوون، ئەمەش وای کرد خەڵکەکەی تووشی دڵەڕاوکێ کرد لەناو شەهیدەکانی برایەك و باوکی (عوسمانی حاجی مەحمود) تێدا بووە.
هەروەها دەنگی شەڕی قورس لەنێوان هێزی پێشمەرگەو لیوای حەرەس جمهوری و موجاهیدین زۆر گەرم بوو، هەروەها خەڵکێکی زۆر شەهید بوون، کە هەواڵەکان دڵخۆش نەبوون کە خەڵکەکەی تووشی دڵەڕاوکێ کرد، هەر ئەو شەوەش شەهید حەمە ڕەشیش لەبەر سەختی برینەکەی کۆچی دوایی کرد.
شایانی باسە لە ڕۆژی ئادارەوە هێرشی ڕژێمی بەعس بۆ سەر ناوچەکان بەردەوام بووەو لە هەوڵی گرتنەوەی شوێنەکان بووەو خەڵکێکی زۆر شەهید بوونە لە پێشمەرگەو خەڵکی شارەکان.
لە ناحیەی پردێ دوای ڕاپەڕینی ڕانیەو شارەکانی دیکە کۆمەڵێ گەنجی خوێنگەرم کە قوتابی و کاسبکارو کۆنە پێشمەرگەو چەکداری فەوجە سووکەکانی لە خۆ گرتبوو. کەوتنە خۆ بۆ ڕاپەڕین و ڕزگارکردنی پردێ.
لە شەوی ٧/ ٨ی ئاداری ساڵی ١٩٩١ لەماڵی یەکێك لە کۆنە پێشمەرگەکان چەند کۆبوونەوەیەکیان ئەنجامدا لە دوایدا لیژنەیەك پێك هێنرا کە چەند بڕیارو ڕاسپاردەیەك دران لەوانە:-
١- پەیوەندی بە هەندێ لاوی تورکمانەوە بکرێ و سەبارەت بە ڕاپەڕین قسەیان لەگەڵدا بکرێ.
٢- سەرجەم ئامادەبووان هەوڵی کۆکردنەوەی چەك و تەقەمەنی بدەن و لیژنەکەی لێ ئاگادار بکەنەوە.
٣- زۆر بە ووردی چاودێری پیاوانی ڕژێم بکرێ بە تایبەتی ئەمن و ئیستخبارات.
٤- بڵاوکردنەوەی جۆرەها پڕوپاگەندە دژی ڕژێم، کە هاندەر بێ بۆ بەرزکردنەوەی وورەی جەماوەر.
٥- بە هەر جۆرێك بێت یەکێك لە وێنەکانی دکتاتۆر بە بۆیە عەیب دار بکرێت.
٦- پەیوەندی بە هەندێ کەسایەتی ناسراوی ناحیەکە بکرێت بەتایبەتی ئەوانەی جێگەی متمانەن و سەبارەت بە ڕاپەڕین ڕایان وەربگیرت لەگەڵ چەند وورده ڕاسپاردەو بڕیاری تر.
پاش نیوەڕۆی (١١ی ئاداری ساڵی ١٩٩١) هەواڵێك لە کەرکوکەوە گەیشتە لیژنەکە کە گوایە ڕژێم دوو (ئامر مەفرەزە خاسەی) گولەباران کردووەو عەلی حەسەن مەجیدیش سەرپەرشتی و ڕەشبگیرییەکی فراوانی لە کەرکوکدا ئەنجام داوەو لەوانەیە هەر ئێستا لە (قەزای دووبز)ەوە شێخ نایف بە هێزێکی عەشایری گەورەوە پەلاماری پردێ بدەن هەر پیاوێکیان دەسکەوێ ئەنفالی بکەن.
ئەندامانی لیژنەکە هەر زوو ئەو هەواڵانەیان قۆستەوەو هەر کەسێکیان ببینایە لەو هەواڵانە ئاگاداریان دەکردەوەو دەیانگوت ئێوارە (پردێ)ش ڕادەپەڕێ.
جێگای خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بە ڕۆڵی بەرچاوو جوامێرانەی پیاوێکی ناسراوی ناوچە کە بکەم کە ئەویش (سابیری شێخ جامی)یە، چونکە لەکاتی بڵاوبوونەوەی هەواڵی هاتنی عەرەبی عەشایر بۆ ئەنفالکردنی خەڵکی پردێ، شێر ئاسا لە پێشەوە هاتبووە دەرو بڕیاری شەڕی مان و نەمانی دابوو جەماوەرێکی زۆری لە دەوری خۆی کۆکردبوو.
لە کاتژمێر (٥/٢٠) خوولەك دووکەس لە ئەندامانی لیژنەکە دوای ئەوەی دەرفەتیان بۆ دەرەخسێ خۆدەکەنە ناو (قاطع الجيش الشعبي)یەکەو دەست بەسەر دۆشکەو چەکدارەکانی ناو (قاطع)ە کە دا دەگرن و هەرزوو هەواڵەش دەگەیەنن جەماوەرەکە بەوەی کە (قاطع)ە کە کۆنترۆڵ کراوە دەستی بەسەردا گیراوە بۆیە (١٠) خولەك بەر لە کاتی دیاریکراو ڕاپەڕین دەستی پێکرد، ئاپۆری جەماوەرەکە لە بەری ساڵەییەوە پەلاماری دامودەزگاکانی ڕژێمیان داو لە چەند ساتێکی کەمدا بارەگای حیزبی بەعس و بەڕێوەبەرایەتی ناحیەو ئەمنی و موکافەحەو بنکەی پۆلیس و پۆستەو نەخۆشخانە دەستیان بە سەرداگیراو کۆمەڵێك ئەمن و ئیستخبارات و پۆلیس بە دیلی کەوتنە دەستی جەماوەرو ڕەوانەی هەولێر کران لەلایەکی دیکەشەوە جەماوەری ڕاپەڕیوی گەڕەکی (تسعين) کە لە چاوەڕوانی کاتی دیاریکراودا دەبن، بەڵام کاتێك گوێیان لە تەقەو پەلاماری جەماوەری ڕاپەڕیوو دەبێت، ئەوانیش لە دیوی لای هەولێرەوە بەسەردامودەزگاکانی بەعسدا بدەن، کەچی لە سەرپردەکەی (تسعين)ەوە دەسترێژیان لێدەکرێ و هاووڵاتییەك بریندار دەبێت بەمەش کاتێك دوا دەکەون، بەڵام دووبارە هێرش دێننەوە ئەمجارەیان لە پردەکە دەپەڕنەوەو دەگەنە یەکتری تا (٩/٣٠)ی شەو هەموو شوێنە دیاریکراوەکان دەستیان بەسەردا گیرا.
فەوجی (٩٠) چەکدارانی مەفرەزە خاسەی ناحیەکە لەکاتی پێویستدا هاتنە دەست و بەشداری ڕاپەڕینان کرد
ڕۆژانی (١٢- ١٣)ی ئادار لاوە خوێن گەرمەکانی پردێ سەرقاڵی دۆزینەوەی پیاوە تاوانبارو بوودەڵەکانی ڕژێم بوون و دەدرانە دەستی ئەو لیژنەیەی کەلەبەرەی کوردستانی پێکهاتبوو.
بەڵام بەداخەوە لە شەوی ٢٧ لە سەر ٢٨ی ئاداردا کە بڕیار بوو قەزای (دووبز)یش ڕزگاربکرێ، کەچی هێرشی پێچەوانەی سوپای ڕژێم دەستی پێکردەوەو ڕۆژی ٢٨ی ئادار ناحیەی ڕزگارکراوی پردێ جارێکی تر داگیرا کرایەوەو سوپای درندەی ڕژێم ٧٥ هاووڵاتی بێتاوانی دەسگیرکردو لە سەربازگەی دووبز گولەبارانی کردن کە زۆربەیان لەبرا تورکمانەکانی پردێ بوون.
پاش ڕزگارکردنی هەولێر لە ڕۆژی ١٢ی ئاداری ساڵی

(١٩٩١) هێزێکی ٥٠٠ پێشمەرگەیان لە پردێ ڕێکخستنەوە لە شەوی ١٦ی ئاداری ساڵی (١٩٩١) نەوشیروان مستەفاو کۆسرەت ڕەسول کۆبوونەوەیەکیان ئەنجامداو بڕیاری گرتنی کەرکوکیان دا.

لە شەوی ١٨ لەسەر ١٩ی ئاداری ساڵی (١٩٩١) هێزێکی ٣٠٠ پێشمەرگەی دابەزینە ناو شارو لە کاتژمێری ٤/٣٠ دەقیقەی بەیانی لەسەر جادەی ڕەحیماوا هێزەکەیان کردە پێنج ڕەتلەوە بەم شێوەیە:-

١- ڕەتلی یەکەم شەهید هەڵمەت سەرپەرشتی دەکرد بۆ گردەکەی ڕەحیماواو کۆشکی قازی.

٢- ڕەتلی دووەم بەسەرپەرشتی ڕەوەند بۆ سەر بارەگای (منظمة)ەکە

٣- ڕەتلی سێیەم کاکەمەندی حاجی کاکەڕەش‌و وەستا سابیر بۆ سەر بنکەی پۆلیس.

٤- ڕەتلی چوارەم بۆ بنکەی عەرەفە بە سەرپەرشتی وەستا ڕەسوڵ

٥- ڕەتلی پێنجەم بۆ سەرکارگەی شیوەکە بەسەرپەرشتی مامۆستا ئەحمەد گۆگجەیی نەسرەدین مستەفا، بۆ سەر کارگەی سێوەکە.

بە شەهید بوونی (حاجی هەڵمەت) سەرەتا پشێووی کەوتە ناو هێزی پێشمەرگەوە، دووژمن لە قەسری قازی‌و عەرەفەوە چەند جارێ پەلاماری دان، بەڵام پێشمەرگە توانی هێزەکەی دووژمن تێك بشکێنێ. وەنەیەڵن دووژمن بێتە نێو گەڕەکی (ڕەحیماوا)وە.

هێزەکانی فەیلەقی یەك‌و هێزە تایبەتەکانی عەلی حەسەن مەجید بە هەموو تواناکانیانەوە، هەوڵی زۆریان دا بۆ گرتنەوەی، پتر بە (١٣٠)دەبابە گەمارۆی گەڕەکی ڕەحیماوایان دا. تەنها لە ماڵی عوسمانی چاوشین ٢١ کەس شەهید بوو تا کاتژمێری چواری ئێوارە پێشمەرگە بەرگری کرد، بەڵام لە دوایدا هێزەکانی پێشمەرگە بە ڕابەری نەوشیروان‌و کۆسرەت ڕەسول‌و عەبدولرەزاق‌و حەسەن کوێستانی گەیشتنە ناو شارو هەموو هێزەکان پێکەوە پەلاماری بەشەکانی تری مۆڵگەکانی دوژمنیان داو پاکیان کردەوە.

دەڤەری گەڕەکی ئیمام قاسم، شانە چەکدارەکانی ڕاپەڕین هەموو مۆڵگەکانی دوژمنیان پاککردەوە.

لە قۆڵی گەڕەکی شۆریجە. هەریەکە لە کەریم چاورەش‌و سەید جەوهەرو سیروان دێرەشەیی، سەرجەم مۆڵگەکانی دوژمنیان پاك کردەوە.

دیارە ماوەی ڕزگارکردنی کەرکوك هەشت ڕۆژ بوو، لەو ماوەیەدا شانە چەکدارەکانی (بروسك) دەوری بەرچاویان هەبوو لە شەڕەکانی باجوان‌و سەربازگەی خالید‌و جێگاکانی تر کە بەدەیان شەهیدی هێزەکانی بروسك بوون بە مەشخەڵی ڕزکاریی کەرکوك.

لەسەر باسی ڕاپەڕین‌و ڕزگاری کەرکوك ناکرێ باسی هێڵە نهێنییەکانی ڕێکخستن نەکەین لەناو شاری کەرکوك کە نموونەی ئەم هێڵانە بەم جۆرەیە:-

* **هێڵی شەهید ڕەفیق ئاغجەلەری.**

ئەم هێڵە لەلایەن (کۆسرەت ئاغجلەر)یەوە سەرپەرشتی دەکرا لە ماڵی (سدیق بەکر بۆریچی - سدیقە ڕەش).

هەریەکە لە شەهید سیروان دێرەشی، شەهید شاهۆ، وەستا سابیر، مەجید ڕۆستەم، سیروان ئەحمەد، سدیقە ڕەش، لەیلا، سیروان حەمە سەعید، سیروان دیسکۆ.

* **هێڵی شۆرش:-**

* ئەم هێڵە یەکێکە لە هێڵە چالاکەکانی ناوشاری کەرکوك دەوری زۆر دلێرانەی هەبوو لە ڕاپەڕین‌و ڕزگارکردنی کەرکوکدا، ئەم هێڵە لەلایەن (کاوە ڕەحیم ڕەزا) ناسراو بە (ئارام)ەوە سەرپەرشتی دەکرا، هەریەکە لە:- غازی کەرکوکی، عەبدوڵڵا شۆریجەیی، شەهید دەشتی عەزیز، سەباح ڕەسوڵ، شێرزاد سەر سپی، عاسی، ستارە ڕەش، دکتۆر عەدنان، محەمەد عەبدولقادر، عادل عەبدوڵڵا، شەریفە شەل، زمناکۆ، لەگەڵ چەند ژێنکدا.

* **هێڵی زریان:-**

یەکێکە لە هێڵە چالاکییەکانی ڕێکخستنی نهێنی شاری کەرکوك بوو، ئەم هێڵە بەر لە ڕاپەڕین ولە کاتی ڕاپەڕین، یەکێك بووە لە کارە چالاکییەکانی شۆڕش کە (زریان - غالب تاها محەمەد قادر) سەرپەرشتی دەکرد.

بەپێی ئەو بەرنامەیەی کە بۆی دانرابوو، دەبوایە لە ١٦ی ئادار کەرکوك ڕزگاربکرایە، بەڵام چەند هۆیەك دەوری هەبوو لە دواکەوتنی تا (١٨- ١٩)ی هەمان مانگ:-

١- ڕەشبگیری خەڵك لە لایەن حکومەتی بەعسەوە.

٢- بارینی بارانێکی زۆر، لە دۆخێکی ئاوادا ئەو هێزەی دێتە ناو شارەوە بەشی زۆری شەهید دەبێت، چونکە دووژمن لە ئامادەباشیدا بوو.

٣- بیرکردنەوە لەناو شارەوە کاتی دەویست‌و سەرکەوتنەکە زیاتر مسۆگەر دەبوو.

٤- چالاکییە ناوخۆییەکانی هێڵەکانی ناو شاریش پێویستی بەکات هەبوو بۆ ڕێکخستن.

دووشت وای کرد گرتنی کەرکوك سەرکەوتن بەدەست بهێنێت:-

١- پشتیوانی جەماوەری شارەکە لە ڕاپەڕین.

٢- هاتنی هێزێکی زۆر لە دەرەوەی شار لە قۆڵی هەولێرو سلێمانییەوە، بوو بەهۆی شکاندنی ئابلۆقە لەسەر پێشمەرگەو رووخانی هێزی دووژمن‌و کەوتنە نێوان هێزی پێشمەرگەو لەناوەوە و دەورەوەی هێزەکەی پێشمەرگە.

دەستەیەك لە کۆنە پێشمەرگەکانی شۆڕشی ئەیلول بەسەرپەرشتی (نەسرەدین مستەفا)و (ئەحمەد حاجی ئاغا دارەمانی) لەگەڵ ئەم هێزەدا فەرماندەیی شەهید (حاجی هەڵمەت) بەشدار بوون.

*** پەلاماردان بەرەو ناوشاری کەرکوك**

**شەوکەتی حاجی موشیر**

خۆم و هێزەکەی لەگەڵمان بوو سەرکەوتینە سەر زنجیرە بەرزایی کە (پشتێنە ئەمنییەکەی) تێدا دروست کرابوو، هەموو ئەو ڕەبایانەی بۆمان دیاری کرابوو گیران و پێشمەرگەمان تێیدا دانا. کە لێرەوە بەشێکی زۆری شاردەر نەکەوت. بەڵام چەند بەرزاییەك لە نێوانی (پشتوێنە ئەمنیە) کەو شاردا بوو هەموویان ڕەبایەیان لەسەر بوو هەندێکیان ڕەبایەی گەورە بوون و (دەبابەیشیان) تێدا بوو تەقەیان نەکرد، دوای ئەم ڕەبایانە سەربازگەی (باروت خانە) بوو ئینجا گەیشتینە گەڕەکی (ئازادی)، لێرەوە کە باشتر لێمان ڕوون بووەوە چیبکەین، ناردم ئەو ئۆتۆمبیلە (ئیڤا)یەی دۆشکوو هاوەنەکەی تێدا بوو بیهێنن بۆ ئەوەی لێرە لەم بەرزاییانەوە تەقەیان پێبکەین لەو ڕەبایانەی کە نەگیرابوو، هەروەها ناردم بۆ ئەوەی هێزەکەی دواوەمان نزیك بخەینەوە لە خۆمان و جارێ نەڕۆن بۆ ناوشار تاوەکو ڕێگاکە تەواو دەکرێتەوە.

پاش کاتژمێر یەك و نیو (١/٥)ی شەو (ئیڤا)کە گەیشت و هێزەکەشیان نزیك خستەوە لێمان، جارێکی تر هێزمان دابەشکرد بۆ ئەو بەرزاییانەی کە نەگیرابوون، بە دۆشکا و هاوەنەکە تەقە کرا لێیان و لەو ڕەبایانەی دوژمنی لێ بوو. پاش (یەك کاتژمێر تەقەو هێرش بردن) توانرا گشت هێزەکانی دوژمن لە ڕەبایەکانیان هەڵکەنین و هەموو هێزەکەمان لە چەند شوێنێکەوە ڕوومانکردە سنووری شار ڕەبایە بەدوای ڕەبایە دەگیراو پێشمەرگە ئاگری تێبەر دەداو ئەڕۆیشتنە پێشەوە. هەر سەرباز بوو خۆی دەدا بەدەستەوەو دەگیران. دەگەیشتینە هەر شوێنێك کۆمەڵە دیلێك دەهاتن بەڕوومان دا دەستیان دەکرد بەگریان و هاوارو دەست ماچ کردن. لە هەموویان لام سەیرتر یەکێك لەو بەندکراوانە بوو لەو کاتی (تەقەو تاریکی شەوو ماندوییە)دا نازانم چۆن منی دۆزیەوە کە لێپرسراوی ئەو هێزانەم. هاتبوو پێشی لێ گرتبووم بەدەست و قاچ ماچ کردن وازی لێ نەئەهێنام و توند دەستی گرتبووم ئەیووت: من خەڵکی نەجەفم هەموو کەس و کارم حکومەتی بەعس کوشتویەتی باخۆیشم نەکوژرێم نوسراوێکم بۆ بکەن بڕۆم بۆ (خارج) دەرەوە.

*** سەربازگەی باروت خانە**

خۆم و کاك سیروانی کوێخا نەجم و هێزێکی (١٥٠کەسی) بۆ سەعات (٣,٥ی) شەو گەیشتینە لای (سەربازگەی باروتخانە) کە بە تەنیشت شارەوە بوو (سیاج حەوشێکی) گەورەی هەبوو هەندێك تەقەی (ڕەشاش و ئاربی جی)مان کرد بەسەری داو دیار بوو هیچ بەرگرییەکی تێدا نەمابوو تەنها گوێمان لە دەنگ و هاواری (تەسلیم تەسلیم) بوو زوو کۆمەڵێك پێشمەرگە بە (ئاربی جی) دەرگاکانیان شکاندو ڕۆیشتنە ژوورەوە دیار بوو پێش نیو سەعات هەموو فەرماندەکانیان بەسەیارەو بەپێ هەڵهاتبوون بەرەو ناوشارو نزیکەی (٧٠) سەربازێکی تێدا مابوو بڕیاریان دابوو هیچ تەقە نەکەن و خۆیان دابەدەستەوەو هەموو چەك کران لەم کاتەی ئێمە لە (باروتخانە) بووین لەناو شارو لە قۆڵی هەولێرەوە تەقەیەکی زۆر گەرم بوو، پێشمەرگەی ئێمە بەپێی باوی پێشمەرگانەی خۆیان دەستیان کرد بە (گوللەی گردار) هەڵکردن بە سەرشارداو بوو بەتەقەی خۆشی. خەڵکی گەڕەکی (ئازادی) کەزانیان باروتخانە گیراوە بەو شەوە لە هەر چوار لاوە (پیاوو ژن و منداڵ) بەهاوار هاواری (بژی پێشمەرگەو بژی کوردستان) ڕژانە ناو سەربازگەی باروتخانە چەك و تەقەمەنی زۆری تێدا بوو بەهەزاران کەس ڕژانە ناوی ئێمەیش لەو کاتەدا بۆمان نەدەکرا بەرگریان لێ بکەین و لە خەڵکەکە بدەین ئەوەی لامان گرنگ بوو (بنکەو سەربازگەکانی) دوژمن بگیرێ و چەك بکەوێتە دەست خەڵکەوە بەکاریان بهێنن بۆ پشتیوانی ڕاپەڕین.

سەربازگەی (باروتخانە) یەکێك بوو لەو سەربازگە کۆنانەی حکومەتی عێراق کە لەساڵەکانی (١٩٣٠)وە سەربازگەو بنکەی سەربازی عێراق بووە لە کەرکوکدا (پێگەو بنکەیەکی) زۆر کۆن و قایمی هەبوو جگە لە حەوشەو تەلبەندێکی بەرزوتووندو تۆڵ. پێم وایە بۆیەکەم جاربوو بەم شێوەیە شپرزە بووبێت و ئەوەندە خەڵکی هاوولاتی تێرژابێت.

ئێمە بە چاکمان زانی ئیتر خۆمان بەم سەربازگەوە خەریك نەکەین و هەرچی زووترە خۆمان بخزێنینە ناو گەڕەکەکانی شار، بۆیە زوو هێزەکانمان لە باروتخانە کێشایەوەو بەجێمان هێشت بۆ خەڵك و کۆمەڵێك کوری گەنجی خوێن گەرم کە چەکیان دەست کەوتبوو بۆ شارەزایی هێزەکە پێشمان خستن و ئەو (١٥٠) پێشمەرگەیەمان کرد بەسێ بەشی (٥٠) کەسی یەوە، بۆهەریەکە لێپرسراویکمان دانا و بەشارەزاوە لە پێشدا گەڕەکی ئازادی پاك کرایەوەو لەوێوە بۆ شوێنەکانی ناوشار بڕۆن و خەڵك بانگ بکەن ڕاپەڕن و پێکەوە پەلاماری بنکەو شوێنەکانی حکومەت بدەن. لەهەموو ئەو هێرشانەدا تا ئێستا تەنها (٥ بریندارمان) هەیەو کەس شەهید نەبووە.

لێرەدا بیرم کردەوە وا ئێمە گەیشتینە گەڕەکی ئازادی دیاربوو قۆڵی هەولێریش گەیبونە (ڕەحیم ئاوا) ئەی بۆچی لای ڕەتڵەکانی ترەوە هیچ دەنگ نییە کەمن لە ئێوارەی (١٧/ ٣/ ١٩٩١)وە لە جیهاز دابڕابووم، ئاگامان لە هیچ لایەك نییە جگە لە دەنگی تەقە نەبێت، وە نەپەیوەندییەکمان هەیە تا بزانین چیمان کردەوە، واخەریك بوو دنیا بەرەو ڕۆژ بوونەوە دەڕۆیشت. بەشێکی هێزەکەی خۆشمان هێشتا هەر لە زنجیرەی (پشتێنەی ئەمنی)ەکە دانابوو تەنها ئەم (١٥٠کەسە) و مەفرەزەیەکی (١٥کەسی) شەوی ڕابردوومان نەبێت ئیتر ئاگامان لە هیچ لا نەبوو و ڕەتڵەکانی تریش ئاگایان لە ئێمە نییەو هەواڵمان نازانن ئەم دابڕانەش بۆ کارێکی عەسکەری و بەرنامەی گرتنی شارێکی گرنگی وەك کەرکوك خراپ بوو.

لەگەڵ کاك (سیروان) ڕێك کەوتین ئەو بمێنێتەوەو سەرپەرشتی ئەم (١٥٠کەسە) بکات و خۆم بگەڕێمەوە بۆ (پشتوێنە ئەمنییەکە) هێزەکەی ترمان زوو بیگەیەنینە ناو شار، هەروەها نامەیەکیش بنێرم بۆ کاك (ملازم عومەر) و باسی بەرەی شەڕی خۆمان و گەیشتنی ئێمە بە (گەڕەکی

ئازادی)بکەین خۆ ئەگەر ئەوان لە جادەوە نەجوولاون بەڵکو ئەم سەرلەبەیانی هێرش بکەن‌و شوێنەکانی خۆیان بگرن‌و رەتڵەکانی تریش ئاگادار بکەن‌و بیانجوولێنێت، چونکە ئێمە تەنها لەم بەرەی خۆمانەوە ئاگادارین وە دەتوانین باسی ئێرە بکەین.

کات ژمێر (٤/٤) چوارو چارەکی سەرلەبەیانی خۆم‌و مەفرەزەکەم بەپێ گەراینەوە بە کاتژمێرو نیوێك گەیشتینەوە لای هێزەکەمان لەسەر زنجیرەی (پشتێنە ئەمنیەکە) خانووی باش‌و سەنگەرو رەبایە (پێگە)ی تووندو تۆڵی لێ دروست کرا بوو هەموو لەوێ بوون بێ تاقەتی هەواڵی ئێمەو گەیشتنی ناوشار بوون ئەوان تارادەیەکی باش پشوویان دابوو، بەڵام ئێمە زۆر ماندوو بووین پەکمان کەوتبوو، لەوێ هەواڵی ناوشارم پێ دان زۆریان پێ خۆش بوو هەموو کەوتنە گۆرانی‌وتن‌و چەپڵەلێدان، بەچاکم زانی نامەیەك بنوسم بۆ کاك ملازم عومەرو بۆی بنێرم‌و خۆم بگەرێمەوە بۆ ناو شار لەگەڵ هێزێکی باشتردا. بەم شێوەیە بە پەلە نامەیەکم بۆ نووسی‌و باسی ئەم بارەی ئێرەم بۆ کردو داوام لێ کرد کە لە رێگەی جیهازەوە ئەم خەبەرە بدات بە رادیۆی (یەکێتی) بۆ بڵاوکردنەوەو ئەوانیش لای خۆیان گەر نەجوولاون پەلە بکەن‌و هێرش بکەنە سەر سەنگەرەکانی دوژمن‌و بیگرن بۆیشم نووسی باری هێزەکانی دوژمن چەند (شرو شپرزە)و شەریان پێ ناکرێت‌و ورەیان رووخاوە تا هۆش نەکەنەوە با دەست بەسەر شاردا بگرین، بەدوو پێشمەرگەی ئازاو گورج‌و گۆڵدا نامەکەم بۆ نارد، ووتم: زوو بگەنە (چیمەن)و لەوێوە بگەنە لای کاك (ملازم عومەر).

پاشان ئەو هێزەی لە پشتەوە مابوو، وام بەچاك زانی ئەم سەنگەرانەی (پشتوێنەی ئەمنی) هەرچۆڵ نەکەین تا بەشی هەرە زۆری شار دەگیرێت، هەروەکو هێزی (یەدەك‌و پشتیوانی) هێزی خۆمان لێ بێت‌و ئەو دۆشکاو هاوانانەی گیراون ئامادەیان کەین بۆ سبەینێ نەوك دوژمن هێرش بکاتەوە تەقەی پێ بکەن‌و پشتیوانی ئێمە بن لەناو شاردا پاشان هێزێکی (٣٠٠کەسی) ترم لێ جیا کردنەوە بەرێ بکەون بەرەو (گەرەکی ئازادی) بەشوێن خۆمداو ئەوانی تریش کە دەمێننەوە پاش ئەوەی رەتڵی ملازم عومەر (زاڵگەی) کەرکوك‌و رەبایەکانیان) گرت، ئەوسا ئەوانیش پاش نیوەرۆ هەر بە رێگەی ئێمەدا بەرەو شار بێن.

کاتژمێر بوو بە (٥،٦بەیانی) کەوتمە رێ بەرەو (گەرەکی ئازادی) چونکە ئەم جارە هەوا رووناك بووبووەوەو سەربەرەو خواربوو بەبێ تەقە بە شارەزایی دەرۆیشتین بەیەك کاتژمێر گەیشتینەوە گەرەکی ئازادی ملمان لێنا بەکۆڵان گەیشتینەوە لای کاك (سیروان کویخا نەجم)و بەرەو ناوشار بەرێکەوتین لە رێگەدا سەدان کەسمان بە شوێن کەوت، لە خەڵکی شار بنکە بە بنکەی حکومەت (بارەگای ئەمنی کەرامە)و چەندین شوێن دەستی بەسەردا گیراو چەندین جاسوس‌و پیاوی حکومەتیان دۆزییەوەو بەسزایان گەیاندن.

*** گەیشتنمان بەهێزەکەی هەولێر**

لەنزیك گەرەکی (رەحیم ئاوا) لەگەڵ هێزەکەی هەولێر یەکمان گرتەوە. کاتژمێر (٩ی سەر لەبەیانی) لەگەڵ (کاك نەوشیروان مستەفاو کاك کۆسرەت) کە لەگەڵ هێزەکانی هەولێر هاتبوون یەکمان گرتەوە پێکەوە رۆیشتینە بارەگای (شعبەی بەعس)و مامۆستا جەمالی حاجی محەمەد کە لەگەڵ رەتڵی کاك ملازم عومەردا بوو ئەویش هات بۆلامان دەرکەوت کە ئەوانیش گەیشتوون‌و زۆر دڵمان خۆشبوو هەردوولا باسی قۆڵی خۆمان کرد کە لە کوێوە هاتووین‌و پاك کراوەتەوە. پرسیاری رەتڵەکانی تری لای ئێمەیان کرد ووتم هیچ ئاگام لێیان نییە بەهۆی نەبوونی جیهازەوە، بەڵام ئەم بەیانییە نامەم نووسیوە لەوانەیە ئێستا ئەوانیش نزیك بووبنەوە، بەڵام بەو پێیەی مامۆستا جەمال لەگەڵ رتڵی کاك عومەر دابوو ئەوانیش گەیشتبوون. پێشمەرگە لە هەموو لا بە هاوکاری خەڵکی شار کە تازە چەکیان دەستکەوتبوو بنکە بە بنکەی حکومەتیان هێرش بۆ دەبرد، یەك لە دوای یەك دەگیران‌و زۆربەیان لەترسدا خۆیان هەڵدەهاتن بەرەو بارەگای (فەیلەقی یەك)و باشووری شارەکە. لە هەموو لاوە گرمەو تەقە بوو لەلای جادەی بەغدادو باشووری شارەوە زۆر جار بەریز تۆپ‌و کاتیۆشا دەهات بۆ ناوشار کوێرانە دەیدا بەناوشاردا، لە زۆر شوێن دوکەڵ بەرز دەبووەوە بە ئاسمانەوەو زیاتر لە (دە هەلیکۆپتەر) بەرز دەگەران‌و تەقەیان دەکرد لە رێگای هەولێرو سلێمانی‌و ناوشارو دەورو بەری دیمەنێکی سەیر بوو. لەو کاتەی ئێمە لە بارەگای (شعبەی بەعسی) کەرکوك بووین لەهەر چوار لاوە گرمە دەهات. بەهۆی جیهازی لاسلکییەوە عەدەد جیهازەکەی (کاك نەوشیروان‌و کاك کۆسرەت) پەیوەندییەکیان کرد بە جیهازەکانی ترەوەو هەواڵی چوونە ناو کەرکوکیان راگەیاند بەهەموو لا. دیار بوو بەهۆی جیهازی گوێگرتنی ئاژانسی (انصاتی) دوژمنەوە شوێنی ئێمەیان لە (شعبە) دۆزیبووەوە بۆیە چەند خولەکێکی نەبرد، چەند هەلی کۆپتەرێك بە (صاروخ‌و لەدەرەوەی شاریش بە کاتیوشا) بارەگای (شعبەی کەرکوك)و دەوروبەریان بەریز بەمووشك دابێژا. سەرجادەی بەردەگای بیناکەو دەوروبەری هەموو گرتەوە بوو بە گرمەو زرمەیەکی زۆر لەرادە بەدەر بەهێز هەموو شووشەی پەنجەرەی ئەم خانوەی ئێمەی لێ بووین بەبیناکانی دەورو بەرییەوە هاژەی کردو هاتنە خوارەوە. بۆیە زوو بە چاکمان زانی بگوازینەوە شوێنێکی تر گەنجێکی خەڵکی کەرکوك هات‌و ووتی: من شارەزام بابرۆینە بارەگای (ئەمنی کەرامە) ئەوێ باشترە بیکەن بە بارەگای فەرماندەیی. بۆیە ئێمەیش دوای کەوتین‌و رۆیشتین بۆ ئەمنی کەرامە، ئیتر چەند جارێ شوعبەی بۆمباران کرد.

دیار بوو هێزەکانی رەتڵی کاك (مولازم عومەر)یش ئەم بەیانییە گەیشتبوونە ناوشارو هێزەکانی دوژمنیان دەرپەراندبوو لەسەررێگایان هەروەها رتڵی لای کاك (رۆستەم‌و دەرویش ئاغایش)و هێزەکەیان گەیشتبوون سەرلەبەیانی هەربۆیە لەهەموولاوە تەقە بوو دوژمن باش شکابوو لە گشت

قوڵەکانەوە. پاشان کاك (نەوشیروان)ووتی: بابڕۆین کاك ملازم عومەریش بدۆزینەوە هەندێك بەرنامەی تازە دابنێین. هەواڵمان زانی ئەوان لە ڕێگەی سلێمانییەوە گەیشتبوونە خەستەخانەی (گەورەی سەدام)کە خەستەخانەیەکی زۆر گەورەو جوان ڕێکوپێك بوو تازە دروست کرابوو، لە زۆربەی ناوەندی پارێزگاکانی ناو عێراقدا لەم جۆرە خەستەخانەیە کرابونەوە جگە لە سلێمانی نەبێت و هەموویشی ناونرابوو (خەستەخانەی سەددام) ئێمەیش هەموومان ڕۆیشتین بۆلای کاك (مولازم عومەر) بۆ خەستەخانەکەو تەماشامان کرد ژێرزەمینێکی زۆر گەورەی هەبوو لەوێ دانیشتین.
بەچاك زانرا دوای یەك گرتنەوە، لێپراسراوەکان و هێزەکان جارێکی تر دابەش بین بۆ ئەوەی گشت شوێنەکانی کە ماون دەستی بەسەردا بگیرێت نیوەڕۆش کۆببینەوە جارێکی تر بەرنامەی تازە دابنرێت لەم دابەشکردنە بەپەلەیەدا:
١- من دانرام برۆم بۆلای (فەیلەق و فرۆکەخانە)و خەبەری ئەو سەربازگەیەش بزانم کەپێی دەڵێن (سەربازگەی خالید).
٢- هێزێك بۆ ڕێگای (کەرکوك - بەغداد) نێردرار بەسەرپەرشتی مامۆستا جەمال.
٣- هێزێکی تر بۆلای (هێڵی شەمەندەفەر).
٤- هێزێکی تر بۆلای (کارگەی کبریت) لە باشووری ڕێگەی (هەولێر-کەرکوك) بەسەرپەرشتی کاك حەسەن کوێستانی.
٥- هێزێکیش بۆ پاککردنەوەی ئەو بنکانەی دوژمن کە لەناو شاردا ماون.
٦- بنکەی سەرەکی پەیوەندی و لۆجستی سپێردرا بە شێخ عەبدولکەریم حاجی کەبارەگای لە دیوانی پارێزگا بێت.
من هەندێك خەڵکی شارەزای کەمم دەست کەوت و ڕۆیشتم بەرەو (فەیلەق) مەبەست لە بارەگای (فەیلەقی سوپای یەکی) عێراقە. ئەمە تاکە سوپایە بۆ سەرکوتکردنی جووڵانەوەی کورد دروستکراوە بارەگای سەرەکی لە کەرکوکەو دەیان ساڵ بوو لێرەوە بڕیاری هێرش بۆ کوردستان دەدرێت، لە ڕاستی دا منیش هەرگیز ئەم شوێنەم نەدیبوو وامدەزانی هەروەکو سەربازگەیەکی گەورە وایە، هەرچۆنی بوو ئەو هێزەی لەگەڵ خۆمم برد، پێش ئەوەی بگەینە ئەو ڕێگایەی ئەیبردین بۆلای (فەیلەق) لەسەر بەرزاییەك خانوویەکی زۆر خۆشی لێبوو دەیڕوانی بەسەر (گەرەکی عەرەفە)دا بە گردێکەوە دروست کرابوو لە چوار لاوە جێگا حەرەسیات و جادەی پان و پۆڕی و بۆ دروست کرابوو بە (گوڵ و گوڵزارو چیمەن و درەختی جوان) ڕازابووەوە. بەبیرم دا هات لە چەند کەسێك بپرسم ئەم بینایە چییە؟ لە وەڵامدا ووتیان: خانووی (عەلی حەسەن مەجید) ئامۆزای (سەدام حسێن)ە ئەم عەلی حەسەن مجیدە پێشتر عەریف بوو (واتا سەربازی سێ خەت) لە سوپای عێراقدا ئێستا لەدوای سەدام حوسێن یەکێکە لە دەستەڵاتدارەکانی عێراق و کراوە بە لێپرسراوی گشت پارێزگاکانی کوردستان لەلایەن بەعسییەکانەوە، دیارە ئەم خانووە بۆ حەوانەوەی ئەو دروستکراوە لە کەرکوك دا. بڕیارمدا جارێك سەرێکی ئەم خانووە بدەین کە سەرکەوتین هەر لە دەرەوەی خانووە کەوە بە چوار دەوری دا بەبەردی (مەرمەڕی) جوان فەرش ڕێژی زەوییەکەی کرابوو.

خانووەکەیش لە دیوی دەرەوەو ناوەوە هەمووی بە (مەرمەر) دروست کرابوو، جگە لەژێر زەمینێك سێ نهۆم بوو. لە ناوەڕاستیدا هۆڵێکی گەورەو ڕازاوە بە (دیکۆراتی) جوانی دارو بەرد نەخش و نیگاری بۆ کرابوو، پڕبوو لە کەلوپەل و ئەساسی جوان کە هەموو دەستکردی ئەورووپی بوون. پەنجەرەو دەرگا لە (ئەلەمنیۆم و داری جوان و نەخشێنراو) دروستکرابوو پەردەی نایاب و کەم وێنەیان بۆ کرابوو لەڕاستیدا وەکو ماڵی یەکێك لە پاشا ناودارەکانی دنیا بوو نەك خانوویەکی ئاسایی جێگای حەوانەوەی خۆی چی لە هۆڵەکەداو چی لە ژووری تایبەت بەهەر چوار لای خۆیدا دەیڕوانی هەندێك بەناویاندا گەڕاین و (پارچە کاغەزو نوسراو هەندێکی تێدا بوو هەڵمانگرت. نامەیەکی خۆی تێدا بوو کە دیار بوو تا سەعات (٣ی سەر لەبەیانی) ئیمڕۆ هەر لەم خانووەدا بوو، پاشان کەزانی پێشمەرگە لە هەر چوار لاوە هێرشیان کرد ئەوسا هەڵهاتبوو چونکە دوا نامەی بەرواری ئەوکاتەی پێوە بوو کە بۆ (عیزەت دوری) نوسیبوو بە بروسکەی جیهاز ڕەوانەی کردبوو لە بارەی بارودۆخی کەرکوك و چۆنییەتی ڕووخانی هێزەکانی حکومەت و هێرشی پێشمەرگەی تێدا نووسی بوو. گلەییشی کردبوو لە رابردووی خۆیان کە چیان بۆ (جاش و بەعسییە) کوردەکان نەکرد وا ئێستا هیچ بەرگری ناکەن و هەڵدێن و ناوچەکان دەدەن بەدەستەوە.
چەند کەسێکی سەر بە ڕێکخستنمان بانگ کرد پارێزگاری لێ بکەن و خەبەر بدەن بە لێپرسراوەکانی خۆمان زوو بگوازنەوە ئێرەو بیکەن بە بارەگا. نامەیەکیشم بۆ بەجێهێشتن کە خەڵك گێچەڵیان پێ نەکات و شوێنەکە تاڵان نەکرێت، بەڵکو بەهۆی ئەمانەوە سڵیان لێبکەنەوە ئیتر ئێمە بەجێمانهێشت بەرەو فەیلەق بڕۆین هێشتا چەند سەد مەترێك لێی دوورنەکەوتبووینەوە، هەلیکۆپتەرەکانی حکومەت لە دوو لاوە خانووەکەیان داگرتەوە بە (مووشەك) دایان بێژاو هەموو شووشەی پەنجەرەکانی بەیەکجار هارەی کردو شکان و هاتنە خوارەوەو لە ناوەوە ئاگری تێبەربوو دووکەڵی لێ بەرزبووەوە، باش بوو ئەو کەسانەی دامان نابوون لای لەناویدا نەبوون ئەگینا هەموو دەکوژران.
نزیك کەوتینەوە لە فەیلەق و هێزەکەم کرد بەسێ بەشەوە، بۆ ئەوەی هەریەك لە جێگەیەکەوە پەلاماری بدەن و پاشان لەناو (فەیلەق)دا یەك بگرینەوە.

### * گرتنی فەیلەقی یەك

کە شارەزاکان نیشانیان داین کامەیە بارەگای فەیلەقی یەك، لەڕاستیدا وەکو شارێك وابوو بە چواردەوری دا دیواری توونددو تۆڵ و (مەحاجەرەی ئاسنی)و تەلبەندی هەبوو، لە هەموو لاوە چەند دەرگایەکی هەبوو، ئەو شوێنەی خۆم و هێزەکە ڕوومان تێکرد دەرگا سەرەکییەکەی بوو، دیار بوو کرابووەوە، بەڵام هێزی وامان نەبینی لەبەر دەرگاکەدا ئێمەیش بۆخۆمان لە نزیکەوە بە (ئار بی جی و ڕەشاش) بەردەرگاو ناو خانووەکانمان داگرتەوە بزانین بەرگری تیایە یان نا؟

دیار بوو لەچەند شوێنێکەوە تەقەمان ڕووبەڕووکرا، بەڵام وادەرچوو کە پەراگەندە بوون و تەقەیەکی گرنگی وا نەبوو بۆیە دوو دەستە پێشمەرگەی (جەربەزەو ئازامان) نارد بەردەرگاکەیان گرت و ناو سەربازگەکەیان دایە بەر تەقەو چوونە ژوورەوە پاڵ دیواری یەکەمین خانووی ناوەوەیان گرت، هەندێك تەقەی تریان لێکردین، بەڵام زۆر کز بوون.

زوو هەموو هێزەکەمان گەیاندە ناو حەوشەو دابەشمانکرد لەبن دیوارەکانی بیناکانی ناو حەوشەکەدا هەر کەس لای خۆیەوە بە کۆڵانەکاندا کەوتە تەقەکردن بۆناو سەربازگەکەو خانووەکان و ڕۆیشتینە پێشەوە جارجار دەستڕێژ دەهات بەرەو لامان بەڵام وادیار بوو هێزێکی وای تێدا نەمابوو. ئەوەیشی کە مابوو لە هەڵهاتن دا بوون، ئێمەیش دابەش بووین بە کۆڵانەکانی داو بەرەو پێشەوە ڕۆیشتین و چەند پێگەیەك (نقطة)ی ئێشکگریان بوو تەقەیان لێوە دەکرا دامانگرتنەوەو زوو گیران و سەربازەکان چەکەکانیان فڕێ داو دەستیان هەڵبڕی و تەسلیم بوون. لێمان پرسین (ئێوە چین لێرەوە لێپرسراوو هێزەکانی ترتان لە کوێیە)؟ ووتیان: یەك کاتژمێر لەمەو پێش ئەم کۆمەڵە سەربازە کە ئێمەین لێرە دایاننایین و لێپرسراوەکانمان بەرەو لای فڕۆکەخانەی (مطار حرية) ڕۆیشتن کە لە باشووری ڕۆژئاوای بارەگای فەیلەقدایەو پێیان ووتین: ئاگاداری ئێرەبن تا دێینەوە ئیتر نازانین بۆ کوێ چوون، ئێمەیش لەبەر دەرگاکەدا نەوەستاین و لەم چەند شوێنەدا دابەش بووین. گەر ئەوان نەهاتنەوە بەلاماندا و پێشمەرگە هات ئێمەیش خۆمان تەسلیم دەکەین، ئەمە بڕیارمان بووە.

هەموو ئەو سەربازانەی لێرە بوون و چەکدار بوون (١٢٠کەس) زیاتر نەبوون، بەڵام نزیکەی (٣٥٠ سەربازی) تری بێ چەکی لێبوو. کە بەدیار (ئۆتۆمبیل و یەدەك و میکانیك و ئامێرو کاری ئیدارییەوە) بوون. ئەمەی کە ئێمە دیمان لەم سەربازگەیە وەکو شارێك وابوو (خانووی زۆر گەورەو بچوك، هۆڵی دورو درێژ، جادەی پان و ڕێکوپێك قوللەو پێگەی بەدیوار دروست کراو، گەراجی زۆرو زەبەندەی هەموو جۆرە ئۆتۆمبیل و میکانیك.. هتد) لە هەندێك لە خانووەکان دا ماڵ و منداڵی پلەدار (دەرەجەدار)ەکانی تێدا بوو. ئێستا ئێمە کە لەناو بارەگای (فەیلەقی یەك) داین کاتژمێر (١١ی) پێش نیوەڕۆی ڕۆژی (٢٠ی ئاداری ساڵی ١٩٩١). ئەو دووبەشەی هێزەکەمان کە ناردمان هەریەکە لەلایەکەوە بڕۆنە ناو فەیلەقەوە تەنها گوێمان لە تەقەیانەو هیچمان نەدۆزییەوە تا ئێستا بە باشمزانی لە پێشدا هەموو سەربازگەکە تاقی بکەینەوە کوێ گیراوە کوێ ماوە. پاشان هەنگاوی تر بنێین چەند سەربازێك لەوێ بوون کورد بوون، ئێمەیان دەناسی هاتنە لام ووتیان دەبین بە پێشمەرگە، لەو چەکانەی ئەوێم پێدان و هاتن لەگەڵمان. ئەو سەربازە چەککراو و بێ چەکانەش مابوونەوە لەناو یەکێك لە هۆڵە گەورەکان دا کۆمانکردنەوەو پێمان ووتن دەرنەچن با نەکوژرێن تا دەگەڕێینەوە لاتان.

ئەو هێزەی لەگەڵ خۆم بوو لە (٤٠کەس) تێنەدەپەڕی بە کۆڵانەکاندا بڵاوەم پێکردن بۆ دۆزینەوەی هێزەکانی ترمان و پشکنینی تەواوی فەیلەق هەر ئەوەندەبوو لەوێدا لەیەك دابڕاین ئیتر ئەوانیشم نەدۆزییەوە لێم وون بوون. ئەوەندە شوێنەکە گەورەو فراوان بوو پڕ بوو لە خانوو کەلوپەلی سەربازی و جۆرەها ئۆتۆمبیلی گەورەو (شۆفڵ و بیلدۆزەر)ی سەربازی دیار بوو هەر کەس لەمن دابڕابوو هەر یەکە بەرەوشتی میلیشایی هەر کەسێك سەری کردبوو بە کونێکداو وون بوو بوون.

هەر بەهەمان شێوە دوو بەشەکەی تری هێزەکە پێشتر ناردبومان وا بڵاوبووبوونەوە نەشدەکرا ئێمە (ماڵ بەماڵ) بگەڕێین بۆیە هەر بەڕاستە جادەکان دا، زیاتر مەبەستم جێگەی فەرماندەییەکانیان بوو بیدۆزینەوە لە چەند جێگایەك دوو کەس و سێ کەس پێشمەرگەمان بینی بەناو خانوو و بیناکاندا دەگەڕان یان خەریك بوون ئۆتۆمبیلێك بخەنە گەڕ گیانمان بەوە بوو هەموو ئۆتۆمبیلەکان (ئیڤاو دیل و لۆری و گەلابە) ئۆتۆمبیلی گەورە بوون جگە لە چەند جێبێکی (وازی) عەسکەری نەبێت ئەوانەش زوو نەئەکەوتنە کار ئەگینا دوور نەبوو هەر یەکە ئۆتۆمبیلێك ببات و، وونتر نەبن. ئەوەی کە لەگەڵ خۆم مابوو تەنها مەفرەزەیەکی ١٢ کەسی بوو بەپێ ئەگەڕاین و لەهەر جێگەیەکەوە دەڕۆیشتین چەند سەربازێکی بێ چەکمان دەدی چەك کرابوون. یان هەر خۆیان بێ چەك بوون نازانین. ئەوەی لای من گرنگ بوو بیدۆزمەوە (بارەگای فەرماندەییەکان و ئەمباری چەك و بەڵگەنامەو نووسراوی گرنگ بوو، هەرکام لەو سەربازانەم دەبینی پرسیاری ئەوەمان لێدەکردن. چەند ئۆفیسێکمان دەدۆزییەوە پارچە پسوڵەو کاغەزی زۆری تێدا بوو نەدەکرا پاسەوانێك بە دیارییەوە دابنێین پێشمەرگەمان کەم بوو بۆشمان هەڵنەدگیرا بە کۆڵ لێپرسراوی مەفرەزەکەی خۆم (حەسەنی مام ساڵح) بوو ڕۆیشت پیکابێکی دۆزییەوەو خستییە ئیش و لەو شوێنانە (پسوڵەو کاغەزو فایلەکانمان) دۆزییەوە خستمانە دوای پیکابەکەو خۆیشمان سواری بووین و ئەوە یەکەم جار بوو لەناو کەرکوك دا بە سەیارە بگەڕێین باش بوو جم و جۆڵەکەمانی خێراتر کرد.

ئەمڕۆ هەوا خۆشە هەندێك هەور بەئاسمانەوەیە لە کوێ گوێت بگرتایە تەقە بوو، دەنگی تۆپیش ناوبەناو دەهات، گرمەی هەلیکۆپتەریش هەربەردەوامە. (بارەگای فەیلەقی یەك) ئەڵێی بەتەگبیر چۆڵکراوە. هیچ لێپرسراوو ئەفسەرێکی گەورەمان بەرچاو نەدەکەوت نازانم (ئەستێرەو خەتەکانیان) فرێدابوو ڕایان کردووە جگە لە سەربازی (شڕۆڵە) نەبێت. تۆ بڵێیت ئەم سەربازگە گەورەیە کە لە کوردستاندا تاکە سەربازگە بوو هەروا چۆڵ بوو بێت یان ئەو هەموو ئەفسەرە سنگ شێرانەی بەعس چییان لێهات.

ئەمە خەیاڵ و داڵغەم بوو لە گەڕانەکەدا جگە لەوەی زۆر داخ لە دڵ بووم بۆ پێشمەرگەکانیش وابڵاوەیان لێکردووە. دەترسام ئەفسەرێکی عێراقی غیرەت بیگرێ و کۆمەڵێك سەرباز کۆکاتەوەو هێرشێك بکات بۆناو سەربازگەکە ئەوسا کارەساتمان بەسەردا دێت بەڵام دیار بوو دوژمن لە ئێمە شپرزە تر بوو، فەرماندەو سەرباز باوەڕیان بەخۆ بە کوشت دان نەمابوو بۆیە وایان لێهاتووە؟!!.

*** عەمباری چەکی (مشجب) فەیلەق**

کاتژمێر بوو بەیەکی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی (٢٠ی ئاداری ساڵی ١٩٩١) هەندێك سەربازمان دۆزییەوە بەدیار سێ هۆڵی درێژەوە بوون. پێش سێ هۆڵەکە لە سەربازگەکەدا حەوشەی تایبەت و پرسگە هەبوو. بێگومان بووم کە لەو شوێنە شتی گرنگی تێدا هەیە!

هەندێك تەقەمانکرد بەدەوری سەربازەکان دا دەستیان هەڵبڕی و داوای تەسلیم بوونیان کرد کە چوینە ناوحەوشە تەلبەندەکەو (پرسگەکەمان)گرت و پرسیارمان کرد لێیان ئێوە چیدەکەن پاڕانەوە نەیانکوژین پێشمەرگەکان چوونە پێشەوە دەرگای ژوورەکان بەدەم یەکەوە بوون و قفڵی گەورەیان لێدرابوو هەموو، پەنجەرەی دەرەوەشیان زۆر بەرز بوو (شیشی پرو قایمی) هەبوو دڵنیابووین کە یان (بەندینخانەیە یان ئەمباری تەقەمەنی)، هەرچۆنێك بوو بە فیشەك قفڵی یەکەم ژوورمان شکاندو ڕۆیشتینە ژوورەوە هەمووی (جل و بەرگی سەربازی و خودەو مەتارەو پۆستاڵ و پێڵاو) بوو، ژووری دووەمان شکاند لەسەر تا خوار سندوقی هەڵچنراوی (فیشەك و گوللەو ئاربی جی و هاوەن)بوو، ئەم ژوورانەش لەناوەوە دەبوون بە چەند ژوورێکی ترەوە هەر کاممان دەکردەوە پڕ بوو لەگەڵ و پەل وەکو (بەتانی، سۆپا، زەخیرە، کومبار، داوودەرمان) دوو ژووری ترمان کردەوە یەکێکیان بچوك بوو ئەوی تریان زۆر درێژ بوو بچوکەکەیان بە سندوق هەڵچنرا بوو، کە دەمانکردەوە هەمووی (دووربینی عەسکەری تازەو دووربینی ئاربی جی و هاوەن و قمباس)بوو. ئێمە (ئەم مەفرەزەیە) تا ئەو کاتە دووربینمان پێ نەبوو هەر پێشمەرگەیەك دووربینێکی هەڵگرت ژوورە گەورەو درێژەکەمان شکاند لە مسەر بۆ ئەو سەر تا (بنمیچ) هەڵچنرا بوو لە سندوقی تازەی درێژ وامانزانی سندوقی گوللە ئاربی جی)یە کردماننەوە هەموو چەکی کلاشینکۆفی تازە، بەسەدان سندوقی هەڵچنراو، لەو هەموو چەکە تەنها دوو سندوقمان خستە ناو پیکابەکەو یەکسەر بە چاکم زانی لەو شوێنەی سەربازەکان حەرەسی بوون دەرگاکان داخەین و پاسەوانیان بەسەرەوە دابنێم و یەکسەر بگەڕێمەوە هێزێکی باش پێشمەگەو چەند سەیارەیەك پەیداکەین و ئەم چەك و تەقەمەنی و کەلوپەلانە بگوازینەوە بۆ (سلێمانی) بۆ ئەوەی نەفەوتێن.

بەم شێوەیە دەرگاکانمان داخستەوەو (حەسەنی مام ساڵح)و سێ پێشمەرگەم دانا بەدیار دەرگای دەرەوەو پێم وتن ڕێگە مەدەن کەس بچێتە ژوورەوە تا دەگەڕێمەوە لاتان.

کە گەڕامەوە بۆ ناوشار بەجارێك شار شڵەژا بووبوو سەرجادەو کۆڵانەکان پڕبوون لە خەڵك و چەکدار ژن و پیاو ڕژابوونە دام و دەزگاکانی حکومەت کەس کەسی نەدەناسی پێش نیوەڕۆ وانە بوو هەر پێشمەرگەو هەندێك خەڵك لەسەر جادەکان بوون. بەڵام دیار بوو خەڵکی شار زانیبویان کەرکوك گیراوە

*** شەهیدەکانی ڕزگارکردنی کەرکوك:-**

فەرهاد حەمەبۆر قەفاری، لوقمان عیزەدین مەحمود وەلی پاشایی، محەمەد عەلی پێنجە، عیسام عەزیز ئەحمەد سادق، سەمیع عەزیز ئەحمەد سادق، سەرکەوت خەلیفە عوبێد عەلی، جومعە قادر وەلی، ستار ئەمین کوێخا خورشید، ئومێد کاکە وەیسی حەساری، کاوە میر عەزیز کۆچەکی، محەمەد ڕازی، ئازاد سەمیع (ئازاد کۆیی)، فەخرەدین ڕەشید، قادر زەمەیی، محەمەد کۆچەکی، خالید محەمەد حوسێنی کاولەسواری، حەسەن (لە مەرکەزی ڕەحیماوا).

هێزێك لە حیزبی شیوعی عێراق بە فەرماندەیی (نەسرەدین ئەحمەد ڕەشاش - حەمە ڕەشاش)، کە نزیکەی (٥٠) پێشمەرگە دەبوون، هاوشان لەگەڵ هێزی پێشمەرگەو لایەنەکانی تر، لە قۆڵی دارەمانەوە بەرەو ڕەحیماوا بە ڕێکەوتن بۆ ڕزگار کردنی کەرکوك.

کە عادل ناوێك، کورد نەبوو کۆمۆنسیتێکی ئازەری ئێرانی بوو لە گەڕەکی ڕەحیماوا شەهید بوو هەر لەوێش نێژرا.

*** هەڕەشەی گرتنەوەی ناوچە ئازاد کراوەکان:-**

لە ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١)دا، دوا بەدوای ڕزگارکردنی شارەکانی کوردستان بە کەرکوکیشەوە، سەرکردایەتی کورد نەیتوانی بەربەستێکی بەرگری تۆکمەی وا دروست بکات، تا ڕێگا بگرێت لە هاتنەوەی سوپای داگیرکەر.. لە کەرکوك (معسکر خالد) ئازاد نەکرا. لە خوارووی عێراق ڕاپەڕینی شیعەکان شکستی خوارد، لەو لاشەوە بەهۆی بەرژەوەندی زلهێزەکانەوە، تیشکی سەوزی دا بە هێزی ئاسمانی عێراق بە لێدانی ڕاپەڕین لە هەموو شوێنەکانی عێراق، ڕژێم کەوتە هەڕەشە لە کوردو شیعەو ناحیەی جۆراوجۆری هەڕەشە ئامێزی بەکارهێنا بۆ لە باربردنی ڕاپەڕین.

*** شەهیدبوونی ڕۆژنامەنووس (گاد گرۆس):-**

*ڕۆژی (٢٩)ی ئاداری ساڵی (١٩٩١) لە کاتی پەلاماری هێزەکانی سوپای عێراق و موجاهیدینی خەلقی ئێرانی بۆ تێکشکاندنی دەسکەوتەکانی ڕاپەڕین و گرتنەوەی شاری کەرکوك، گەرمەی شەڕەکانی بەرگری لە چیمەن و لە هەڵەتەکانی خۆرهەڵاتی شاری کەرکوك، هێزەکانی ڕژێمی بەعس ڕۆژنامەنووسی ئەڵمانی (گادگرۆس)یان شەهیدکرد. (گادگرۆس)، قەڵەم و زوومی کامیراکەی گەواهی ڕاستەقینەی نەبەردییەکانی ناوشاری کەرکوك بوون. هەر بۆیە خۆی لە یاداشتەکانی دا نووسیبووی:" بە کامێراکەم بەشداری خۆشی و زەماوەندی سەرکەوتنی کوردەکانم کرد".

*** (داستانی بەرگری چیمەن):-**

ڕۆژی (٢٩)ی ئاداری ساڵی (١٩٩١) دوای داگیرکردنەوەی کەرکوك لەلایەن هێزی سوپا و موجاهیدینەوە، تیپێك پێشمەرگەی دەڤەری سلێمانی کە هەفتەی پێشتر بەشداری ڕاپەڕین و ڕزگاری کەرکوکیان کردبوو لە کاتی کشانەوە، لە هەردەکانی (چیمەن) لە ڕۆژهەڵاتی کەرکوك، بەربەو هێزە گەورەویەی ڕژێم دەگرن کە دەیەوێت بۆ قەرەهەنجیرو

چەمچەماڵو سلێمانی پێشڕەویی بکات. لە نەبەردییەکی دلێرانەدا چەند جارێك پاشەکشە بە هێرشەکانی دوژمن دەکەن.. بەڵام بە داخەوە لە پڕێکدا پۆلێك هەلیکۆپتەر دێنە سەریانو شەڕی زەویو ئاسمان دەکەن بەیەك، بەداخەوە لەونەبەردییەدا پەنجاو سێ پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان شەهید بوون، دواتر تەرمەکانیان لە چیمەن بەخاك دەسپێردرێن.

*** پەلامار بۆ سەرگرتنەوەی ( پردێ ):-**

یەکێك لە هۆکارەکانی مانەوەی مەترسییەکانی سەرخەڵكو شاری کەرکوك ڕزگار نەبوونی (دووبز) بوو، هەر کە ڕژێم بەرنامەو نەخشەی بۆ گرتنەوەی کەرکوك خستە مەیدانی جێبەجێکردنەوە، سوودی لە ڕێگای (دووبز)و (پردێ) وەردەگرت.

هێزێکی گەورە بە پاڵپشتی تانكو زرێپۆشو هەلیکۆپتەر پەلاماری (پردێ)یان داو داگیریان کرد، لەسەر ڕێگای گشتی (پردێ - کەرکوك)و لە کەلی (قەرغەتوو)و (کتکە)وە بەرەو (کانی دوومەڵان)و (دارەمان) پێشڕەوییان کرد.

وەك تۆڵەسەندنەوە لە خەڵکی شارۆچکەی پردێ (٢١) کەسیان شەهید کردو پتر لە (٨٤) هاووڵاتی تورکمانو کوردیان گرتو بە دەستو چاو بەستراوی لە گۆڕستانی (دووبز) گولە بارانیانکردن.

*** سەرچاوە**

ڕاپەڕینو ڕزگاری کەرکوك، مەلا شاخی، لاپەڕەی جۆراجۆر.

*** هۆکارەکانی شکستی ڕاپەڕین لە بەهاری ١٩٩١.**

گەر بەوردی ئەو بارودۆخەی ڕاپەڕینی بەهاری (١٩٩١) ی پێدا تێپەڕی سەرنج بدەن، کۆمەڵێك ڕووداوو هۆکاری کاریگەر هەن کەوای کرد ئەو ڕاپەڕینە بەو گەرمو گوڕییەوە نەتوانێت دوامەبەستەکانی کە ئازاد کردنی گشت ناوچەکانی کوردستان بوو لە دەست ڕژێمی عێراق بپێکێو لە ماوەیەکی کورتدا بەهەمان لێشاوی پەلامار دانو بۆ پێشەوەچوونو بەرەو دوا بکشێتەوەو شکست بهێنێتو ڕژێمی عێراق گشت شارەکان بگرێتەوەو زیانی گەورەش لە جەماوەری خەڵکی کوردستان بکەوێت لە گشت بوارەکان (ماددیو مەعنەویو مرۆییەوە) بەرای من ئەو هۆکارانە لەم خاڵانەی خوارەوەدا خۆیان دەبینن:-

١- پێکهاتەی (بەری کوردستانی) لەبنەرەتداو لەسەر بنچینەیەکی (تێگەیشتنو ڕەزامەندیەکی دەروونی لە ناخەوە) نەبوو لە نێوان لایەنە سیاسیەکانی بەرەی کوردستانیدا کە چەند ساڵ بوو لە (شەڕو ناخۆشی)دا بوون لەگەڵ یەکترداو درزو برینێکی گەورە لە نێوانیاندا بوو بە ئاسانی سارێژ نەدەکرا. خۆیان لە کوردستاندا بەرنامەیان بۆ دانەنابوو، بەڵکو پاش شکستی هەموو لایەنەکانو دوای کارەساتەکانی (ئەنفال) لە (١٩٨٨)وە پەنابردنیان بۆ (حکومەتی ئێران) کە ڕێکیان بخاتو مەرجەکانی بەرژەوەندی ئێران لە ئاشتییەکەیاندا پارێزراو بێت، کە ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی گشت کاتێك چاوەڕوانی تێکچوونو هەڵوەشانەوەی لێ بکرێت؟.

٢- لە بنەرەتدا بەرنامەی ڕاپەڕین، وەکو: (بەرەی کوردستانی) بەرنامە ڕێژی وردبینانەی بۆ نەکرا بوو وەکو لە پێشەوە باسمان کردووە تەنها یەکێتی باوەڕی بە ڕاپەڕین هەبوو لە پێشدا، بەرنامەی خۆی بۆ دانا بوو لایەنەکانی تر بەرنامەی (هاوبەشی تۆکمەو داڕێژراو)یان نەبوو لەگەڵ یەکێتی دا بۆیە هەر لە دڵەوە پێیان خۆش نەبوو بەرنامەکانی یەکێتی قبوڵ بکەنو کاری بۆ بکەنو بەرەو سەرکەوتنی بەرن.

٣- گرێدانی ڕاپەڕینی کوردستان بە ڕاپەڕینی شیعەکانی خوارووی عێراقەوە (ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی) هێنابووە سەر ئەو بیروڕایەی هەردوولا (ئێرانی ئیسلامی) پشتیوانی لێدەکات. بۆیە دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی خوارووی عێراق لەلایەن ڕژێمەوە، بەرگریان نەکرد لە هێرشی سوپای عێراق بۆ پەلامار دانەوەی کوردستان.

٤- ترسی ئەمریکاو هاوپەیمانەکان. لەو هەلو مەرجە شکاوەی (حکومەتی بەعسی) عێراق. گەر ئەو ڕاپەڕینە پەرە بستێنێ دوور نییە گۆڕانکاری لە (بەغدا) ببێت بکەوێتە ژێر کاریگەری (ئێرانی ئیسلامی) کە لە چەند ساڵی ڕابردوویدا دژایەتی (ئەمریکاو ڕۆژئاوای) دەکرد، بۆیە هەر زوو ڕێگەیان دا بە (ڕژێمی عێراق) هێزبەکار بهێنێت بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکە بە پشتیوانی (تانكو زرێ پۆشو تۆپو هەلی کۆپتەرەکانی).

٥- ئەمریکاو زلهێزەکان مەبەستیان لە شەڕی کوەیت دا ڕزگارکردنی کوەیتو سەپاندنی هەندێ مەرج بوو بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان. مەبەستیان ڕزگار کردنی خەڵکی عێراق نەبوو لەدەست ڕژێمی سەددام حوسێن، بۆیە هەر زوو پشتی ڕاپەڕینی بەردا.

٦- لایەنە سیاسییەکانی کوردستان پێشتر بیریان لەوە نەکردبووەوە کە هێزی چەکداری گشت لایەنەکان بکەن بە (سوپای کوردستان) لەژێر فەرماندەیی یەك (سەرکردایەتی شارەزاو بەهێزو بە ئەزموون) دابێت، کە باش هەڵی سووڕێنێت، بۆیە هەر کە هاتینەوە ناو شارەکان هەر حیزبە بۆخۆی بڕیارێکی دەداو میلیشیای بێ سەرو بەری دروست دەکردو دەیجووڵاند. هیچ بڕیارێکی ناوەندی جێبەجێ نەدەکرا.

٧- لەبەر فرەلایەنیو هەرکەس بۆ خۆیی لایەنەکانو کێ بەرکێی ناشەریفانە، نەئەتوانرا ئەو هەموو چەکدارەی حکومەت کە پەیوەندییان کردبوو بە ڕاپەڕینەوە زوو ڕێك بخرێنو سوودیان لێ وەربگیرێ بۆ هێرشو بەرگری، بۆیە ئەو خەڵکە چەکدارانەش هەر زوو هەستیان بەبێ سەرووبەری (حیزبەکان)کردو کەوتنە خۆفرۆشتن بەم لایەنو ئەولایەن لەبری ئەوەی لایەنە سیاسییەکان سوود لە خەڵکە چەکدارە وەربگرن بە پێچەوانەوە ئەوان سوودیان لە حیزبەکان وەردەگرتو بەکاریان دەهێنان بۆ مەبەستی پەیداکرد لە زەمانی ڕابوردوویان زیاتر بوو.

٨- لەبەر فرەلایەنیو فرە بڕیاری، نەتوانرا ئەو گشت (چەكو تەقەمەنییە) زۆرو زەبەندەی دەستکەوتی ڕاپەڕین کە هەموو جۆرە چەکێکی گەورە بچووکی تێدا بوو بەباشی بەکار بهێنرایە. کە دەتوانرا (سوپایەکی) بەهێزی پێدروست

بکرایە بەئاسانی لە شکان نەهاتایە، بۆیە هەمووی بێ سوود لێ وەرگرتن (فەوتا و خوراو تێکدراو لەناوبرا)ن.

٩- کادیرو فەرماندەکانی بەرەی کوردستانی لە چەند سالی رابردووی شەر لەگەل حکومەتی عێراق تەنها (شەری پارتی زانی و شەری شاخەکان) شارەزا بوون بەچەکی سووک و ناوەندی، هیچ ئەزموونێکیان لە شەری بەرگری و پەلاماری ناوشارەکان نەبوو، یا بەکارهێنانی چەکی قورسی بەرگری بۆیە کە هێرشی دوژمن دەستی پێ کرد بەرەو شارەکان زوو شکان و بەرگریان پێ نەکراو نەشتوانرا بوو سوود لەو هەموو خەلکە شارەزایانەی سوپای عێراق وەرگیرێ کە بەدیل گیرابوون یان پەیوەندییان بە راپەرینەوە کرد بوو.

١٠- لەبەر بێ بەرنامەیی و کۆنترۆلی سنوورەکان (حکومەتی ئێران) سنووری لە هەموو لاوە کردەوە لەو ماوە کەمەی راپەریندا سەدان (ئۆتۆمبیل و ماشێن و چەکی قورس و کەرەستەی دائیرە) گرنکەکان فرۆشراو ئاودیوی ئێران کرا کە کاریگەری زۆر خراپی هەبوو بۆ تێکدان و کەمکردنەوە لە سەنگ و قورسایی کادیرو پێشمەرگە لەناو جەماوەر کە هەلپەکردن بۆ بە دەستهێنانی دەستکەوت و خۆ دەولەمەند کردن لەو هەل و مەرجە ئالۆزەی شەردا کە بووە بەهۆی کزبوونی (گیانی دلسۆزی و لە خۆبوردن و قوربانی) دان و کەم بوونەوەی ئیلتزام و سەرهەلدانی بەرەلایی و شیرازە تێکچوون.

١١- حیزبە بچوکەکان کە پێشتر بنکەی جەماوەری و هێزی چەکداریان نەبوو، هەلپەکردنیان لە کۆکردنەوەی خەلکی هەمەجۆر لە دەوری خۆیان و پەیداکردنی (چەک و کەلوپەل) لەو رۆژانەی راپەرین و شەردا کە بەهەلیان دەزانی (لەو کاتەی هێزی لایەنە سیاسییەکان لەبەرەی شەردا بوون) ئەوان خەلکیان رادەکێشا و دلخۆشیان دەکرد، کە دەبووە هۆی لاوازکردنی سەنگەرەکانی بەرگری و ساردبوونەوەی دلی خەلکە دلسۆزەکەو پێشمەرگە کۆنەکانیش لە بەرگری و قوربانیدان وەرس دەبوون.

١٢- لەو ماوەی تێکەل بوونی (پێشمەرگەو جەماوەرو چەکداری راپەرین) زۆر کرداری خراپ و تالانباری لە کوردستاندا روویدا بەتایبەت لەناو شارەکاندا بەناوی پێشمەرگەوە (لەراستی دا زۆری پێشمەرگە نەبوون ئەنجامیان دەدا بەلکو خەلکانی تر بوون)، بۆیە زۆر کاریگەری خراپی هەبوو لەسەر سووک بوونی ناوی پیرۆزی پێشمەرگەو ئەو (قودسیەتەی) جارانی نەما.

*** (ئە نجامە باشەکانی را پەرینی بەهاری ١٩٩١)**

سەرەرای ئەو ئاسەوارە خراپ و زیان بەخشانەی لە راپەرین دا سەریان هەلدا لە کوردستانی عێراق. کۆمەلێك دەستکەوتی بە شوێن دا هات کە دەتوانرێت بەوەرچەرخانێکی گرنگ بژمێردرێت لە خەباتی سەختی گەلی کوردا:

١- دەرکەوت گەر جەماوەرو لایەنە سیاسییەکان یەك دەست و یەك دل پالپشتی یەکتر بکەن دوژمن هەرچەند بەهێزبێت دەتوانرێت باش بشکێنرێت و لە کوردستان دەرکرێت.

٢- لە تەمەنی رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق دژی خەلکی کوردستان هێزیان کۆ کردەوەو کوردستانیان کرد بە سەربازگەیەکی گەورە بۆ ماوەی زیاتر لە (٣٠) سال. لە کەمترین ماوەدا بەهاوکاری جەماوەرو پێشمەرگە لە بنەرەتەوە لەبەریەك هەلتەکاو تەفرو توونا کراو هێزێکی بێشوماری چەکداری رژێمی عێراق داڕووخا ئەمە سەلماندی گشت هەولی دوژمنان بێ سوود بوو لە داگیرکردنی کوردستان وە لە ئاییندەشدا هەر بێ سوود دەبێت..؟

٣- رژێمەکانی عێراق بەگشتی و رژێمی بەعسییەکان بەتایبەتی بووبوون بە دێوەزمەیەکی درەندەو ترسناك لە سالانێکی دوورو درێژدا جەماوەریان (کپ کردبوویەوەو خەساندبوویان) کەس زاتی نەدەکرد لە پێستی خۆیدا بجوولێتەوەو هاوکاری ئاشکرای شۆرش بکات. ئەم راپەرینە ئەو (سام و ترسەی جەماوەری لە رژێم) شکاند و (کەم بایەخ و سووك)بوو کە لە ئەنجامی راپەرینەکانی دواتری هەمان سالدا هەرچەند هەندێ لایەنی بەرەی کوردستانیش پارێزگاریان لە پیاوەکان و هێزەکانی رژێم دەکرد کەچی جەماوەر لە زۆربەی کوردستان رژێمیان شاربەدەر کرد و خۆی نەگرتەوە.

٤- بۆ رژێمی عێراق روون بووەوە کە ناتوانێت بە ئاسانی وەکو جاران دەست بەسەر خەلکی کوردستاندا بگرێ و دایمرکێنێ بۆیە ناچار بوو هێزو دام و دەزگاکانی لە بەشێکی گرنگی کوردستان بکشێنێتەوەو بەجێی بهێلێت.

٥- ئەو کۆرەوە مەزنەی مانگی نیسانی (١٩٩١) کە بەچەندەها ملیۆن کەس دەژمێردرا بە (گەلان و دەولەتانی دنیا)ی نیشاندا کە گەلی کورد جارێکی تر لە سایەی رژێمی (ئاگرو ئاسن) دا ناژی و دەبێت چارەسەرێك بۆ کێشەی کوردستانی عێراق بدۆزێتەوە، ئەوە بوو (UN)و ولاتە هاوپەیمانەکان هاتن بەهاواری گەلی کوردەوە (ناوچەی ئارام) لە کوردستان دا دامەزراو قۆناغێکی گەورە کێشەی کورد بۆ پێشەوە چوو. بەهەموو دنیای ناسێنرا.

٦- لەدوای دامەزراندنی ناوچەی ئارام و کشانەوەی دەزگاو هێزەکانی عێراق لە بەشی زۆری کوردستان ئیدارەی ناوچەکە کەوتە دەست خەلکی کوردستان.

٧- هەر بۆ یەکەم جار لە مێژووی گەلی کوردا بەهۆی دەستکەوتی راپەرینەوە هەلبژاردنی گشتی سالی (١٩٩٢) لە کوردستان دا کراو پەرلەمانی کوردستان هەلبژێردرا کە بەدەستکەوتێکی گرنگی سەردەم دەژمێرێت.

٨- پەرلەمانی کوردستان حکومەتی هەرێمی کوردستانی پێکهێناو لە بەشێکی گرنگی ناوچەکەدا ئیدارەی کوردی دامەزراند بە بەرچاوی گشت دنیا سەلمێنرا گەر دوژمن وازمان لێ بهێنێ ئەتوانین ئیدارەی خۆمان بکەین.

٩- جەماوەرو لایەنە سیاسییەکانی کوردستان فێری ئەزموونی ئیدارەکردنی خەلك و کاری سیاسی بەرفراوان و کاری دیبلۆماسی کوردی بوون.

١٠- لە ماوەی ئازادی ئیدارەی خۆمالی دا (سەدان وەفدو نوێنەری ولاتان و دەزگای راگەیاندنی) دنیا هاتووچۆی کوردستانی عێراقیان کرد و باشتر شارەزاو ئاشنا بوون لە کێشەی گەلی کورد و لە قاوغی کێشەی ناوخۆی عێراق چووە دەرەوە.

١١- لە راپەرینەکاندا سەدان تاوانبار لە پیاوەکانی رژێم بەسزای خۆیان گەیەنران‌و تۆڵەیان لێ کرایەوە، ئەمانە چەند ساڵ بوو دەستیان بەخوێنی کورد سووربوو لەکاتی شەڕی بچووکدا ئاسان نەبوو دەستی شۆڕشیان پێبگات و ژمارەیەکی زۆر (تاوانباری شارەزاو سەرکوت کەری) خەڵکی کورد لەناو دەسەڵاتی رژێمدا لەناوچوون.

١٢- لایەنە سیاسییەکان گەشەیان کردو هەزاران کەسی تازە لە دەوری هەرلایەك کۆبوونەوەو بنکەی ئازادی سیاسی بەرفراوان بوو لە کوردستاندا.

١٣- گەلی کورد بوو بە خاوەنی دەزگای راگەیاندنی هەمە جۆری خۆی (منداڵ‌و گەنجی) کورد لە پەروەردە کردن‌و گۆشکردنی سیاسەتی رژێمە داگیرکەرەکان رزگاریان بوو بەراهێنان‌و پەروەردەکردنی کوردستانی‌و نیشتمانی‌و نەوەکانی بە ئازادی پێدەگەن‌و پەروەردە دەکرێن دوور لە سیاسەتی گڵاوی داگیرکەران.

١٤- هەر لایەنێکی دڵسۆزی کوردو شۆڕش دەتوانێت لەو ماوەی ئازادیدا بیر لە چارەسەری خاڵە لاوازەکانی سەرەتای راپەرین بکاتەوەو ئەزمونیان لێ فێر بێت بۆ رۆژانی داهاتوو.

١٥- سەرەرای ساڵەهای ساڵی خۆ بەهێزکردنی رژێم لە کوردستاندا لەو ماوەی راپەرین دا توانرا گەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت دەست بەسەر شارە گەورەکانی کوردستان بەگشتی‌و (کەرکوك‌و خانەقین) بەتایبەتی بگیرێ لەدەست رژێم بهێنرێتە دەرەوە، بسەلمێنرێت کە هەر سیاسەتێکی (راگواستن‌و تەعریب‌و تەبعیس) ئەنجام بدات لە کوردستاندا ئەو شارو ناوچانە هەر کوردستانن‌و موڵکی نەتەوایەتی گەلی کوردن.

١٦- لەدەست بەسەراگرتنی دامودەزگا جاسوس‌و سەرکوت کەرەکانی رژێما لە کوردستان هەزاران (فایل‌و دیکۆمێنتی) گرنگ کەوتە بەردەستی خەڵکی راپەریوو لایەنە سیاسیەکان، (مەلەف‌و فایل) زۆربەی خەڵك بە (جەماوەرو کەسە سیاسییەکانی) ناو لایەنەکانەوە کەوتە دەست‌و ئاشکرا بوون، کە رابردووی زۆر کەسی خستە ناو کەوانەی پرسیارەوەو پەردە لەسەر زۆر راستی لادراو ئاشکرا بوو.

*** کۆرەوەکەی کوردستان:-**

پاش ئەوەی بەشێکی گەورەی شارەکانی کوردستان لەلایەن رژێمی بەعسەوە گیرایەوە، بەتایبەتی کەرکوك، پردێ، کەلار، کفری، خورماتوو، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر دەروونی خەڵکی دروست کرد کە ئەمە وای کرد بەشێکی زۆری خەڵکی کۆرەویان کرد بۆ سنوورەکانی ئێران‌و تورکیان ئاوارەی شارەکان بوون.

بەشێکی زۆری خەڵکی کەرکوك شارەکەیان بەجێهێشت، کە عەرەبەکانی کەرکوك‌و تکریت‌و موسڵ‌و شارەکانی تری عێراق بەرەو کەرکوك هاتن‌و ماڵە کوردەکانیان تاڵان کرد کە بەشێکی زۆری گەرەکەکانی شۆڕیجە، ئیسکان، رێوییە، ئازادی، ئیمام قاسم، بەرتەکیە، بە تەواوەتی تاڵان‌و دزی تێکراو بەشێکی زۆری سەرچاوەو کەلتووری شارستانی کورد تاڵان‌و سووتێنراو گەلێك شوێنی کەرکوك کەوتە بەر تاڵان.

١- تاڵانکردنی کتێبخانەی گشتی کەرکوك‌و سووتاندنی بەشێك لە کتێبە کوردییەکانی ناوی کە هەندێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بەبوونی دەستی کارمەندانی کتێبخانە دەکرێت لەو کارەدا.

٢- تاڵانکردنی بەرێوەبەرایەتی شوێنەواری کەرکوك‌و تاڵانی کۆتەڵ‌و دەستنووس‌و پارچە شوێنەوارییەکان.

٣- سووتاندنی بەشێك لە فەرمانگەکان.

٤- دزین‌و تاڵانکردنی بەشێکی زۆری دەستنووس‌و سەرچاوەی دەگمەنی مزگەوت‌و تەکیەو خانەقاکانی کەرکوك بۆ شوێنی نادیار.

٥- دزین‌و تاڵانکردنی بەشێکی زۆری کتێبخانەکانی ماڵە کوردەکانی کەرکوك.

٦- دزینی هەموو شتێك کە زەرەر بە کوردو کەلتوورەکەی بدات.

٧- شەهیدکردنی بەشێکی زۆری کورد لە گەرەکە کوردییەکان ئەوانەی کە مابوونەوە.

*** مانگرتنەکانی ساڵی ١٩٩١ وەك یەکەم شێوە خەباتی مەدەنیی دەرەنجامی ڕاپەڕین**

دوای ڕاپەڕینی ئازاری ساڵی ١٩٩١ی باشووری کوردستان و ڕزگارکردنی شارەکان و دوورخستنەوەی دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێمی بەعس، دەوڵەتی عێراق دامودەزگا کارگێرییەکانی خۆی لە هەر سێ پارێزگای هەولێرو دهۆك و سلێمانی کێشایەوە بۆشاییەکی کارگێری لە هەرێمەدا دروستبوو و ئابلوقەی ئابووریشی خستە سەر هەرێم، جاربە جار لە ناوچەکانی تەماسدا هێرش و پێکدادان لەنێوان هێزی پێشمەرگەو هێزەکانی عێراقدا دروست دەبووو مەترسیی دووبارە پەلاماردانەوەی کوردستان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە هەبوو. جگە لەمە دەرەنجامی سیاسەتی سەرکوتکەرانەی (٢٣) ساڵی پێشتری دەسەڵاتی ڕژێمی بەعس لە کوردستاندا، ژمارەیەکی زۆر هاووڵاتیی کورد لە ئەنجامی شاڵاوەکانی ئەنفالدا بێسەرو شوێن کرابوون و چارەنووسیان دیار نەبوو، ئەمانەش هەمووی پێویستیان بەوەبوو هێزە سیاسییەکان بەتایبەتی و جەماوەری کوردستان بەگشتی ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوەو بەدواداچوون بن و خۆیان بۆ بەرێوەبردنی ئەم قۆناغە نوێیە ئامادە بکەن.

ئەوەبوو لە ئەنجامدا مانگرتنەکانی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٩١ی لێکەوتەوەو سەرەتا لە ٥ی کانوونی یەکەم لە شاری سلێمانی و دواتر لە ٦ی کانوونی یەکەم لە شارەکانی هەولێرو دهۆك و ڕانیەو سۆران و کەلار مانگرتن و خۆپیشاندانی بەدوادا هات. کە تیایدا سەدان گەنجی کورد بۆ ماوەی (٨) تا (١٠) ڕۆژ لە بەردەم بارەگاکانی نەتەوە یەکگرتووەکان مانیان لە خواردن و خواردنەوە گرت و بە یاداشت و بەیاننامەکانیان، داواکارییەکانی کوردیان لەم قۆناغەدا خستە ڕوو.

ئەم مانگرتنانە بزووتنەوەیەکی جەماوەریی سەرتاسەری بوون لە هەرێمی کوردستانداو بەبێ لەبەرچاو گرتنی ئینتیمای حیزبی و بیروڕای سیاسی، سەرجەم چین و توێژو پێکهاتەکانی کوردستان بەشدارییان تیادا کردو وەك یەکەم هەنگاوی خەباتی مەدەنی و دیموکراسیانەی دووای ڕاپەڕین لە باشووری کوردستاندا دەرکەوت، هەروەها جۆرێك لە بەرزکردنەوەی وورەی جەماوەرو دەرخستنی یەکریزی کوردو لەو قۆناغە هەستیارو ناسکەدا گەیاندنی دەنگی کوردیش بوو بە جیهانی دەرەوە.

*** هۆکارەکانی مانگرتنەکانی ساڵی ١٩٩١**

هەرچەندە سەنتەری شارە گەورەکان، بەتایبەت هەولێرو دهۆك و سلێمانی و کەرکوك لەلایەن سوپای عێراقەوە بۆ ماوەیەك دەستی بەسەردا گیرابوو، بەڵام بەعس نەیدەتوانی بەرێوەیان ببات و خۆی ڕابگرێت، بۆیە لە کۆتایی ساڵی (١٩٩١)دا عێراق هێزە سەربازییەکانی بۆ دەرەوەی ناوچەی دژە فرین کێشایەوە، هەر دوای ئەوە سەرجەم دامودەزگا کارگێرییەکانیشی لە هەر سێ پارێزگای هەولێرو دهۆك و سلێمانی کێشایەوە، جگە لە شاری کەرکوك و خانەقین، بەمەش بۆشاییەکی کارگێری لە هەرێمدا دروستبوو، ڕژێم داوای لە فەرمانبەرانی کرد کوردستان جێبهێڵن و بەرەو ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی حکومەت بچن. بەڵام کاتێك زۆربەی زۆریان ئەو داخوازییەیان ڕەتکردەوە، بەغدا وەك کاردانەوەیەك مووچەو خانەنشینی هاووڵاتیان و کارمەندانی بڕی، کە نزیکەی (٣٠٠، ٠٠٠) کارمەندانی حکومی لە مووچەو مافەکانی خۆیان بێبەشکران.

دوای ئەوە ڕژێم ئابلوقەی ئابووریشی خستە سەر ناوچە ئازادکراوەکانی هەرێم و ئازوخەو سوتەمەنی بەتەواوی لێ قەدەغەکردن، جگە لەو ئابلوقە ئابورییەی کە لەلایەن نەتەوەی یەکگرتووەکانەوە بەسەر عێراقدا سەپێندرابوو، هەرێمی کوردستان دووجار ئابلوقەی کەوتە سەر، لە ئەنجامی ئەوەدا نرخی شتومەك زۆر بەرز بۆوە، خەڵکی بۆ دابینکردنی ژیانیان کەوتنە فرۆشتنی کەلوپەلەکانی ناو ماڵیان، بازارەکانی کوردستان پڕبوو لە پارەی قەڵب (پارەی لە چاپدراوی عێراقی).

مەبەستی ڕژێمی بەعس ئەوە بوو کە بەم هەنگاوانەی چەند نیشانێك بپێکێت، لەوانە:-

١ - لەو کاتی گرانی و برسێتییەدا، گەلی کورد برسی تر بکات، بۆ ئەوەی سەر دانەوێنی و بەکەمترین ماف ڕازی بێت.

٢ - نانەوەی کێشەو گیروگرفت بۆ بەرەی کوردستانی کە بە خەیاڵی خۆیان ئەمڕۆ یا سبەی دەگاتە ڕادەی لێکدابڕانی بەرەی کوردستانی و جەماوەر.

٣ - دروستکردنی بۆچوونی جیا لەناو بەرەی کوردستانیدا، کە بە خەیاڵی ئەوان ڕێ بۆ لێکترازانی بەرەی کوردستانی خۆش دەکا.

بەم جۆرە ڕژێمی بەعس ئومێدی بەوە بوو کە ئاڵۆزی باری ئابووری و ئیداری ببێتە هۆی پاشاگەردانی و حیزبە سیاسییەکان بکەونە ململانێ و شەری یەکترو ئەمەش وا لە کورد دەکات لەبەرامبەر بەغدا بکەونە سەرچۆك، بەڵام لەو ساتەدا ڕژێمی بەعس ئەو ئومێدەی بەدی نەهات. جار بە جار لەناوچەکانی تەماسیشدا هێرش و پێکدادان لەنێوان هێزی پێشمەرگەو سوپای عێراقدا دروست دەبووو مەترسیی دووبارە پەلاماردانەوەی کوردستان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە هەبوو.

چەند جارێك خۆپیشاندان و ڕاپەڕینیش لەلایەن جەماوەرەوە لە شارەکانی هەولێرو سلێمانی و ڕانیەو کۆیە دژ بە ڕژێم دووبارە بوونەوەو لەلایەن چەکدارانی ڕژێمە تەقە لە خۆپیشاندەران کرا، بەڵام هێزی پێشمەرگە کە لە شارەکاندا بوو پشتی جەماوەریان گرت.

سەرباری ئەمە، گفتوگۆی نێوان ڕژێمی بەعس و بەرەی کوردستانی ساردیی تێکەوتبوو، بەڵام نەپچرابوو، ئەوەبوو لە سێپەتەمبەری ساڵی ١٩٩١ ڕژێم بۆ جارێکی تر پەیامی دانووستاندنی دایەوە بە بەرەی کوردستانی و داوای دیداری مەسعود بارزانی کرد، لە ئەنجامدا بارزانی دیدارەکەی قبوڵ کرد، بەو مەرجەی دیدارەکە لە بەغدا نەبێ لە ١٥ی سێپەتەمبەری ١٩٩١ بارزانی لەگەڵ عیزەت دووری و حوسێن کامیل دا لە کەرکوك چاویان بە یەکتری کەوت، ڕژێم داوای

ئەوەی دەکرد کە دەبێت لە داهاتوودا وەفدی (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان) لەلایەن خودی مام جەلالەوە نوێنەرایەتی بکرێت، دوادیداری بارزانی لەگەڵ سەددامدا لە ۳۰ نۆڤەمبەری ساڵی ۱۹۹۱ بووو لە ٤ی دیسەمبەردا بارزانی لە بەغدا گەڕایەوە، ئەوکاتە بارزانی داوای لابردنی گەمارۆی ئابووری لەسەر هەرێمی کوردستان دەکرد بە گەڕانەوەی متمانە لە نێوان بەرەی کوردستانی و ڕژێمی بەعس.

بەرەی کوردستانی ماوەی هەشت مانگ لەگەڵ حکومەتی عێراق لە گفتوگۆدا بوو، وێرای دەرکەوتنی مانۆڕو فرتو فێڵەکانی ڕژێم مایەوەو درێژەی بە گفتوگۆی خۆی لەگەڵ ڕژێمدا دەداو جەماوەری کوردستانیش کە بەتەمای ئەوە بوون داخوازییەکانیان هەر لە ڕێگەی ئەم گفتوگۆیەدا چارەسەر بکرێو بێتەدی، کەچی بە پێچەوانەوە بە بنبەست گەیشتنی گفتوگۆو ئامادەنەبوونی ڕژێم بۆ سەلماندنی کەمترین داخوازییەکانی گەلی کوردستان، ئەو خەڵکەی بەتەواوی ئومێد براو کردو ناچاریکردن کە بۆ هێنانەدی داخوازییەکانیان جارێکی تریش بێنەوە مەیدان.

جگە لەمە دەرەنجامی سیاسەتی سەرکوتکەرانەی (۲۳) ساڵی حوکمی بەعس لە کوردستاندا، ژمارەیەکی زۆر هاوولاتیی کورد لە ئەنجامی شالاوەکانی ئەنفالدا بێسەروشوێن کرابوونو چارەنوسیان دیار نەبوو، ئەمانەش هەمووی پێویستیان بەوەبوو هێزە سیاسیەکان بەتایبەتیو جەماوەری کوردستان بەگشتی ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوەو بەدواداچوون بنو خۆیان بۆ بەڕێوەبردنی ئەم قۆناغە نوێیە ئامادە بکەن.

هەموو ئەمانە، برسێتیو نەبوونیو گەمارۆی ئابووری دوو لایەنە، دروستبوونی بۆشایی ئیداریو کشانەوەی دامو دەزگا فەرمییەکان، ترس لە هێرشو پەلاماری ڕژێمی بەعسو ناڕۆشنی داهاتوو و چارەنووسی خەڵك، وەك پێویست ئیدارە نەدانی هەرێم لەلایەن بەرەی کوردستانییەوە، بوونە مایەی ئەوەی مانگرتنەکانی کانوونی یەکەمی ۱۹۹۱ی لێبکەوێتەوە. کە تیایدا سەدان گەنجی کورد بۆ ماوەی (۸) تا (۱۰) ڕۆژ لە بەردەم بارەگای نەتەوە یەککگرتووەکانو فەرمانگە فەرمییەکاندا مانیان لە خواردنو خواردنەوە گرتو بە یاداشتو بەیاننامەکانیان داواکارییەکانی کوردیان لەم قۆناغەدا خستە ڕوو، بۆ پشتیوانی کردنیشیان ڕۆژانە لە سەرجەم شارو شارۆچکەکانی کوردستان بەسەدان هەزار هاوولاتی دەڕژانە سەر شەقامەکانو بەشداری خۆپیشاندانەکانیان دەکردو بەرەو ڕووی نووسینگەکانی نەتەوە یەککگرتووەکان دروشمیان بەرز دەکردەوە.

ئەم مانگرتنانە بزوتنەوەیەکی جەماوەریی سەرتاسەری بوون لە هەرێمی کوردستانداو بەبێ لە بەر چاو گرتنی ئینتیمای حیزبیو بیروڕای سیاسی، سەرجەم چینو توێژو پێکهاتەکانی کوردستانی بەشدارییان تیایدا کردو بە یەکەم هەنگاوی خەباتی مەدەنیو دیموکراسیانە دادەنرێت لە باشووری کوردستاندا. جگە لەمە ڕێگەیەکیش بوو بۆ بەرزکردنەوەی ورەی جەماوەرو دەرخستنی یەکریزی کوردو گەیاندنی دەنگی کوردیش بوو بە جیهانی دەرەوە لەم قۆناغە هەستیارو ناسکەدا.

دەستپێکردنی مانگرتن لە سلێمانی:- (۱۳) لاوی کورد کاتژمێر (۱۲)ی ڕۆژی ٥ی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۹۱ لە شاری سلێمانی بڕیاریاندا مان بگرن، یاداشتێکی (۷) خاڵیان نووسی بۆ نوێنەری نەتەوە یەککگرتووەکانو داخوازییەکانیان تێدا خستبووە ڕوو، بەڵام گرفتی سەرەکییان بریتی بوو لە چۆنییەتی وەرگێڕانی داواکارییەکانیان بۆ زمانی بە ئینگلیزی، بۆ ئەم مەبەستە هانا دەبەنەبەر مامۆستایەکی کیمیا، بەڵام ئەو لە ترسی بەرەی کوردستانی بۆی نەکردوون، پاشان پەنایان بردبوو بۆ مامۆستایەکی زمانی ئینگلیزی، بەو مەرجەی ناوی نەهێنرێت یاداشتەکەی وەرگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی. دوای لەبەرگرتنەوەی چەندین دانەو بڵاوکردنەوەی بەناو خەڵکی دا چوونە بەردەم نوسینگەی کۆمیسارىای پەنابەران (UN) لە سلێمانیو یاداشتەکەیان پێشکەش کرد، (بەهجەت) کە یەکێ لە مانگرتووەکان بوو وەك نوێنەری مانگرتوەکان براوەتە ژوورەوە بۆ بارەگاکەی (UN)، دوای (۳) کاتژمێر گفتوگۆکردن، داوایان لێ کردوون بگەڕێنەوەو سبەی کاتژمێر (۹) وەڵامیان دەدەنەوە، بەڵام مانگرتووەکان ڕازی نەبوون.

لەم بارەیەوە (کامەران سەعید کوردە) کە یەکێی لە مانگرتووەکان بوو نووسیویەتی:-

"دوای ئەوەی یاداشتەکەمان پێشکەش بە نوێنەری (UN) کرد، وەڵامی داینەوەو وتی یاداشتەکەتان بەرز دەکەینەوە بۆ بارەگای کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە جنێف، پاشان وەڵامتان ئەدەینەوە، نوێنەری (UN) ڕەخنەی لەسەر ئەوە هەبوو کە گوایە پێشتر کاتتان بۆ دانەنراوە، واتە (موعد)تان نیە،نوێنەرەکەمان لە وەڵامدا وتی ئایا مردن کاتی بۆ دانراوەو کاتی هەیە؟ کامەران لە درێژەی بابەتەکەدا نوسیویەتی" نوێنەرەکەی (UN) پێی وتین: جارێ واز لە مانگرتن بهێنین چونکە ئەو داخوازیانەی ئێوە گەلێ گرانەو پێویستی بە دیراسەو کۆبوونەوەی مافی مرۆڤە لە (UN)، ئێستاش وا سەرماو سۆڵەو برسییەتی کاری تێکردوون، هەڵسن بڕۆنو پاشان وەڵامتان ئەدەینەوە. بەڵام نوێنەرەکەمان وەڵامی دایەوەو وتی: ئێمە نموونەیەکی زیندووین لەو خەڵکە بێدەرەتانو برسییەو ئێمەش بەشێکین لەوان، تاکو وەڵاممان نەدرێتەوە بەردەوام دەبین لەسەر مانگرتن بۆ ئەوەی بیسەلمێنین.

کاتژمێر (۹)ی سەرلەبەیانی ڕۆژی (۷ی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۹۱) بەشێکی زۆر لە دانیشتوانی شاری هەولێر خۆپیشاندانێکی بەرفراوانیان سازکرد، کە لە هەموو کونو قوژبنێکی شارەوە هاتبوون، لە زانکۆو قوتابخانەو کارگەو ئۆردوگاکانەوە بەپێ بەرەو بارەگای نەتەوە یەککگرتووەکان لە شارۆچکەی عەینکاوە چوون، بۆ پشتگیری لە مانگرتووەکانی سلێمانی، داواکارییەکانی جەماوەری هەولێریان بەرزکردەوەو پێشکەشی نوێنەری نەتەوە یەککگرتووەکانیان کرد، ئەم خۆپیشاندانە شەش کاتژمێری خایاندو لە ئەنجامدا (۱۰٤) کەس لەبەزدەم بارەگای نەتەوە یەککگرتووەکاندا مانەوەو مانیان لە خواردن گرت.

*** مانگرتن لە ڕانیە:-**

ڕۆژی (٧ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٩١) جەماوەری شاری ڕانیە پشتیوانیان لە مانگرتووەکانی شاری سلێمانی کردو لەبەردەم نوسینگەی (UN) بۆ هەمان مەبەست کۆبوونەوە، هەزاران کەس لە قەلادزێو سەنگەسەرو چوارقورنەو حاجیاوا چوونە شاری ڕانیەو لەوانیش چەند لاوێك مانگرتنی خۆیان ڕاگەیاند بۆ ئەم مەبەستە یاداشتێکیان دا بە نووسینگەی نەتەوە یەکگرتووەکان.

*** مانگرتن و خۆپیشاندانەکان لە شارەکانی تری کوردستان:-**

لە چەند شارێکی تریش مانگرتن و خۆپیشاندان دەستی پێکرد، لە قەزای سۆران ڕۆژی ٧ی کانوونی یەکەم گەنج دەستیان بە مانگرتن کردو جەماوەری شارەکەش بۆ پشتگیری دەستیان بە خۆپیشاندان کرد، هەمان کات (مستەر ئوتو) لێپرسراوی نوسینگەی (UN) بۆ مانگرتووان و خۆپیشانەران دوواو وتی " خۆشحالم بەهەستی پڕ لە جۆشتان بەهەمان شێوە ڕۆژی ٧ی کانوونی یەکەم جەماوەری کەلار چوونە بەردەم بارەگای (UN)و دەیان کەس مانگرتنیان ڕاگەیاند.

هەروەها ڕۆژی (١٠ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٩١) جەماوەری ئامێدیو دهۆك خۆپیشاندانێکی گەورەیان ڕێکخستو لەوێش کۆمەڵێك کەس مانگرتنیان لە خواردن ڕاگەیاند. ئەم مانگرتنانەش بەردەوام بوون تا ڕۆژی ١٤ی کانوونی یەکەم لەگەڵ شوێنەکانی تر کۆتاییان پێهات.

١- دەرکەوت کە ڕاپەڕین سەرەتای قۆناغێکی نوێی لە مێژووی گەلی کورد هێنانە کایەوە، ئەم قۆناغەش قۆناغی دوای ڕاپەڕینە. قۆناغی داهێنانی شێوەی نوێی خەباتو خوڵقاندنی بەهرەی بنێ تێکۆشانی زەحمەتکێشانە، قۆناغی درێژەکێشانی ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی (١٩٩١) وەك ڕاپەڕینی بەردەوام تا لووتکەی سەرکەوتن.

٢- مانگرتن ئەزموونێکی نوێ بوو لە خەباتی سی ساڵەی نەتەوەی کورددا، چونکە مانگرتن لە خواردن شێوەیەکی خەباتی ئاشتیخوازانەی جیهانییەو بەتایبەتی ئەگەر لەبەردەم بارەگاکانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بێت، ئەوە بە شارستانی ترین جۆری تێکۆشانو لەئاستو پلەیەکی بەرزی مرۆڤایەتی دادەنرێت.

٣- سەرجەم پارتە سیاسیو ڕێکخراوە پیشەییەکانی باشووری کوردستان بەشداریان لەو خۆپیشاندانانەدا کردو پشتگیری مانگرتنەکانیان کرد، جگە لە پارتی دیموکراتی کوردستانو بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق.

٤- مانگرتن و خۆپیشاندانەکان ڕەنگدانەوەیەکی بەرچاویان لە میدیا جیهانییەکاندا هەبوو.

٥- مانگرتن و خۆپیشاندانەکان لە ڕووی مەعنەویو چەسپاندنی شێوەی خەباتەوە سەرکەوتنێکی سیاسی کاریگەری هێنایەکایە، پشت بەستن بە خەڵك بەوشێوە خەباتە ببێتە قەناعەتێکی گەورەو دڵخۆشکەر، هەموو لایەكو خەڵکیش تێگەیشتن وەك تەواوی گەلانی دونیا کە: خەباتی چەکداری لەپاشەکشەدایەو خەڵك ئومێدی بەشەڕ نەمابوو. دوای تێکشکاندنی ڕاپەڕین، ڕێرەوی ڕاپەڕین بەشێوەی جۆراوجۆر درێژەی هەیە. جەماوەر کە نارەزایی گەیشتە تینی مەرج نییە چاوەڕێی بڕیاری هێزە باڵا دەستەکان بکات. مافە دیموکراسییەکانی میللەتی ژێر دەستە کێشەیەکی سیاسی گرنگەو دەبێ بڕیاری چارەسەرکردنی بدرێتە سەر.

٦- ئەم مانگرتنە بووە سەرەتایەکی باشو کرانەوەی دەروازەیەکی نوێ لەلای کوردی باشوور بۆ داواکردنی مافە نەتەوەییو خزمەتگوزاریەکانیان.

٧- داواکانی مانگرتووان جێبەجێکرا بن یان نا، ئەزمونەکەیان لە کوردستان ئەزموونێکی تازە بوو، ئەگەر ڕۆشنبیرانی کوردستان بایەخی پێبدەن، بەرهەمی باش بەدەستەوە ئەدا، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ئەبێ هێزە سیاسییەکانی کوردستانو جەماوەر، بایەخی تەواو بە شێوەکانی خەباتی هێمنانە بدەنو لە پێناوی بەدیهێنانی مافە نەتەوایەتیو داوا جەماوەرییەکاندا پەرەیان پێبدەنو کارامانە بەکاریان بهێنن.

٨- هەرچەندە ئەگەر داخوازیو داواکارییەکانیش زۆر بوون، بەڵام هەمووی خۆی لەوەدا دەبینیەوە کە کورد دەیەوێت بە ئازادی لە خاکی خۆیدا بژی.

*** سەرچاوە:-**


- ڕۆژنامەی کوردستان نوێ، ژمارە (٦٩٣٢) ساڵی (٢٠١٦)، لاپەرە (٢- ٣)، و (٤ -٥)و (٦-٧).

# هاتنی
# ئینگلیزەکان بۆ کەرکوك
# لە ساڵی ١٩١٨




ئینگلیزەکان لە خوار قەڵای کەرکوك




سوپای ئینگلیزەکان لەسەر قەڵای کەرکوك



مەشقی سەربازیی ئینگلیزەکان لە خوار قەڵای کەرکوك



سوپای ئینگلیز لەسەر پردی داقووق



کۆمەڵێك گیراوی عوسمانی



سوپای ئینگلیز لە کاتی پشوودا



سوپای ئینگلیز لە ئاوی سەر پردی داقووق






ئینگلیزەکان لەسەر پردی داقووق پاش ڕووخانی پردەکە لەلایەن عوسمانییەکانەوە

*** شەڕی داعش و كەركوك**

**وەستا رەسوڵ**

(داعش) وشەیەكی چوار پیتی جێی مشتوومڕە، كە لە جیهانی ئەمڕۆی توندڕەویدا ئاماژەیە بۆ رێكخراوی دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شام، لەسەر ریتمی هەڵكۆڵینی زمانەوانیی و كورتكردنەوەی ناو دەستەواژەكان، بەڵام ئەم ریتمە سیمبولییە زمانەوانییە هەموو شتێك نییە كە چەكدارانی داعش بە دوایدا وێڵن، لە كاتێكدا كە نوێنەرایەتی (قاعیدە)ی عێراق دەكەن، هەروەك چۆن لە پێشدا قاعیدەی ئەفغانی و بۆسنی و چیچانی ناویان دەركرد، كە لەسەر ئاستی لۆكالی چێژی (قاعیدە) زیاتر قبوڵكراو دەكات، بەو پێیەش ئەم لێكچواندنە لە تێگەیشتن و خوێندنەوەو لێكدانەوەی (داعش) وەك بەشێك لەو باجە خۆی نمایش دەكات كە (قاعیدە) بە گوێرەی كلتوورە، بەرجەستە بووەكانی شوێنەكان فۆرمۆلەی كردووە، بە تایبەتی لە سایەی بوونی چەند خاڵێكی هاوبەشی بەهایی و مێژوویی لە نێوان هەموو ئایدۆلۆجیا و رێكخراوو ئوسولییەتە توندڕەوییەكاندا لە فۆرمە ئایینی، ناسیۆنالستی و بەعسییەكەیدا[1].

داعش رۆژی (٣)ی ئۆگوستی ساڵی (٢٠١٤) بە شێوەیەكی كتوپڕ لە چەند بەرەیەكەوە لە زوممار، شەنگال، بەنداوی موسڵ، مەخموور پەلاماری باشووری كوردستانیدا، داعش لەم هێرشانەیدا تەواوی ئەم ناوچانەی داگیركرد، ئەم هێرشانە داعش لە ئەدەبیاتی سیاسی خۆیدا بە ناوی (فتوحات) ناویدەهێنێت، زیانێكی گەورەی بە پێكهاتەی سەربازی، ئەمنی، سیاسی، ئابووری و مۆراڵی كوردستان گەیاندووە، بەقسەی هەندێك لە پسپۆڕانی سیاسی، هێرشی داعش ئەوەندە كتوپڕ پێشبینینەكراو بوو كە زۆربەی سەركردە سیاسی، هەواڵگری و سەربازییەكانی كوردستانی خافڵگیر كرد[2].

شەوی (٩) لەسەر (١٠)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠١٤) لە سیناریۆیەكی سەیرو سەمەرەداو كەمتر لە (٢٤) كاتژمێر شاری موسڵ داگیركرا، ئەتوانین بڵێین كە گرتنی موسڵ وەك سێیەم گەورەترین شاری عێراق، رووبەڕووبوونەوەی داعشی بردە قۆناغێكی مەترسیدار چ بە گوێرەی سەروەری عێراق و چ بە گوێرەی هاتنە پێشەوەی داعش وەك دەوڵەتێكی نوێ و خاوەن هێزو سوپا و جبەخانەیەكی تۆكمەی چەك و سەرەڕای دڵنیابوونی داعش لە بوونی سەرچاوەیەكی ئابووری كە ئەویش نەوتە.

داعش لە هێرشەكانی پشت ئەستوور بوو بە پاڵپشتی هۆزو خێڵەكانی عەرەبی سوننە، ئەمەش وەكو كاردانەوەیەك بۆ ئەو هەموو نادادپەروەری و سیاسەتی دوور خستنەوەو ریشەكێش كردن لە حكومەتەكەی (مالكی) لە ماوەی دوو خولی حوكمرانیدا بەرامبەر بە شارە سوننە مەزهەبەكانی عێراق كە كاولكاری و بێكاری و هەژاری بوونە سیمای سەرەكی ئەو ناوچانە. بەواتایەكی تر دروستبوون و بە هێزبوونی ئەم گرووپە ئیسلامییە توندڕەوانە لە عێراق دەرئەنجامی كردەوەو رەفتارە هەڵەكانی حكومەتی مەركەزی عێراق بوو[3].

*** گرنگی كەركوك لە ستراتیژی (داعش):-**

**١- بنەما (سروشتییەكان):-**

بنەما سروشتییەكانی كەركوك پشتبەستە بە چەند هۆكارێك ولە سەرووی هەمووشیانەوە (هەڵكەوتەی شوێنی كەركوكە) و ئەم ناوچەیە هەمیشە كەوتبووە سەر پێگەی بازرگانی وكۆمەڵایەتی و شارستانییەكانەوە، ئەمەش وای لێكردووە، كە كاریگەری سیاسی و ئابووری و سەربازی خۆی هەبێت لەسەر ناوچەكانی تر لە كاتی جیاوازدا. گرنگترین خاڵی بەهێزی كەركوك شوێنكەوتنی دوورییەتی لە دەوڵەتە هاوسنوورەكان لە هەموو سنوورەكانیدا، چونكە سنوور هەمیشە گرفتی پاراستن و هێرشكردن و سەنتەرە.

كەركوك خاڵێكی سەرەكی پێكدەهێنێ لەسەر رێڕەوە بازرگانییەكان لە ئێرانەوە لە رۆژهەڵات و ئەنادۆڵ هەر لە دێر زەمانشییەوە كەركوك كەوتبووە سەر رێگای و رێڕەوەی ئاوریشم، كە لە چینەوە تاكو كەنارەكانی ئەوروپا درێژبووەوە پاشان بووە بەشێك لە رێگای سوڵتانی كە میزۆپۆتامیای بە شام و ئەنادۆڵ دەبەستەوەو تاكو دروستبوونی دەوڵەتی عێراق بەردەوام بوو.

**٢- بنەما ئابوورییەكان:-**

شاری كەركوك و دەوروبەری پێگەوبنەمای ئابووری بە هێزی هەیە كە هەموو عێراق دەژێنێت، كە وەكو شارێكی نەوتی دەناسرێت و سەرچاوە سروشتییەكانی لە سەرچاوە بەهێزو دەوڵەمەندەكانی ناوچەكەیە.

هەروەها زەوی كشتوكاڵی بە پیتی هەیەوسەرچاوەیەكی بەرچاوە بۆ ژیان و گوزەرانی مرۆڤ لەو شوێنەدا، هەروەها رێگەی پەیوەستەو گونجاوە بۆ گرێدانی كوردستان بە باشوورو ناوەڕاستی عێراقەوە.

*** شەڕی داعش و كشانی بەرەو كەركوك:-**

پاش داگیركردنی شاری موسڵ لە (١٠)ی نیسانی (٢٠١٤) لەلایەن گرووپە چەكدارەكانی داعشەوە، دڵەڕاوكێ و شپرزەیی و جموجووڵێكی نائاسایی هەموو ئەو سنوورانەی گرتەوە كە سوننەنشین بوون، كەركوكیش لەو رەوشە بە دەرنەبوو، بە پێی نزیكی قەزای حەویجە لە موسڵ و هاوسنووری لەگەڵ تكریت و بوونی ژمارەیەكی زۆر لە ئەفسەرانی رژێمی پێشووی بەعس لەو ناوچەیە، سەرەڕای هەبوونی چەندین گەرەكی سوننەنشین لەناو شاری كەركوك.

ئەم بارودۆخە نائاساییە فەرماندەكانی هێزی پێشمەرگەی خستە باری ئامادەباشی و خۆئامادەكردن بۆ ئەگەری هێرشی داعش بۆ سەر كەركوك و دەستبەسەرگرتنی كێڵگە نەوتییەكانی كەركوك یا تەقاندنەوەی كە كارەساتی سروشتی و مرۆیی و ئابووری بەدوای خۆیدا نەهێنێ.

بەگشتی بارودۆخی ناوشار شێوا بوو، بەهۆی ئەو دەنگۆیانەی كە ترس و تۆقاندنەكانی ناو شاری موسڵیان دەگێڕایەوە.

بارەگاکانی سوپای عێراقی بە هەمان سیناریۆی موسڵ چۆڵکراو کەوتەدەست خەڵك، فەرماندەی فیرقەی دوانزە سەردانی پارێزگاری کرد، بینای فیرقە بە لیوای یانزەی وەزارەتی پێشمەرگە سپێردرا، کە پێشتر بەشێکی زۆری کەلو پەلە سەربازییەکانی ناو فیرقە لەلایەن ئەفسەرە عێراقییەکان و خەڵکانێکی تری مەدەنییەوە تاڵان کرابوو.

بۆ ڕۆژی دوایی بە مەبەستی پاراستنی شاری کەرکوك، چەند لیوایەکی هێزی پێشمەرگە جوڵێندرا بەم شێوەیە:-

١- لیوای یەکی پیادە بە فەرماندەی (عەمید شێرکۆ فاتیح) کە لە ساڵی (٢٠١١) لە سنووری کەرکوك جێگیرکرابوو، لە ساڵی (٢٠١٣) کە خەندەقەکەی باشووری کەرکوك لێدرا، لیوای یەکی پیادە لەسەر لێواری خەندەقەکە بەرامبەر سووپای عێراق جێگیرکرا، بارەگای لیوای یەك لەسەر هێڵی شەفەندەفەرەکە دانرا، لە کاتێکی زۆر گونجاودا توانیان جووڵە بکەن و لە خوارووی کەرکوك جێگیربن.

ڕۆژی (١٠)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠١٤) فەرماندەیی فیرقەی دوانزەی سوپای عێراق فەرمانی بە لیواکانی (٤٦- ٤٧) کرد، کە لە باشووری کەرکوك پاشەکشێ بکەن بۆ ناو سەربازگەی (کەیوان) بۆشایی ئەمنی و سەربازی لە خوارووی کەرکوك دروست بوو.

فەرماندەی لیوای یەکەی پیادە زۆر ئازایانە فەرمانی بە فەوجەکانی (١، ٢، ٣) کردبوو بەرەو سەر پرۆژەی ئاودێری کەرکوك بجووڵێنن، بە جێگیرکردنی هێزەکانی لیوای یەکی پیادە لە سنووری (تەللوەرد) تا (مەریەم بەگ) مەترسی هاتنە پێشەوەی داعش بۆ ناو کەرکوك نەما.

٢- لیوای شەش بە فەرماندەی (عەمید سەید ساڵح) بە هەمان شێوە لە خوارووی کەرکوك جێگیرکرا.

٣- لیوای یانزە بە فەرماندەیی (لیوا نەهرۆنەسوەد) لە گوندی مەلا عەبدوڵڵای کۆن جێگیرکرا.

٤- لیوای سێی تایبەت بە فەرماندەی (عەمید ئەیوب) لەناو فرۆکەخانەی کەرکوك جێگیر کرا.

٥- لیوای دووی تایبەت بە فەرماندەیی (لیوا تەها کانی بەردی) لەسەر پرۆژەی ئاوی (مەریەم بەگ) جێگیرکرا.

٦- لیوای (سەدو شەش) بە فەرماندەی (لیوا حەمە هەژار) لە پشتی ناحیەی (تازە) جێگیر کرا.

٧- لیوای (سەدو بیست و هەشت) بە فەرماندەیی (لیوا عوسمان شارستێنی) لە پشتی گوندی (چەرداغلو) جێگیر کرا.

٨- لیوای (سەدوسی و چوار) بە فەرماندەی (عەمید هیوا ڕەش) لەسەر خەندەقەکەی خوارووی کەرکوك جێگیر کرا.

٩- لیوای (یەکی سکرتارییەت) بە فەرماندەیی (لیوا مەحمود بێسەری) لە سنووری خوارووی کەرکوك دابەشکرا.

١٠- هێزەکانی پشتیوانی دوو بە فەرماندەیی (عەمید مەریوان ئاگری) چەکە گەورەکانیان بە شێوەیەکی ڕێکوپێك دابەشکرد بوو لە سەرتاسەری هەموو میحورەکان.

١١- لە میحوەری خوورماتوو بە هەمان شێوە بە فەرماندەیی (عەبدوڵڵا بۆر) ڕێکخراو بەسەر شوێنەکاندا دابەشکرا.

١٢- لە میحوەری پردێش بە هەمان جۆر هێزی پێشمەرگە دابەشکرا.

*** داگیرکردنی گوندی (بەشیر) لەلایەن داعشەوە:-**

لە ١٧ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠١٤) داعش هێرشی کردە سەر گوندی (بەشیر) و لە کاتژمێر (١٢٠٠) گوندەکە کەوتە دەستی داعش و هێزە سەربازییەکان زیانێکی زۆریان بەر کەوتوو گەلێك شەهیدو برینداریان هەبوو، هەندێ لە تەرمی شەهیدەکان کەوتبوونە دەستی تیرۆرستان، کە تەرمی چوار لە شەهیدەکان هی پێشمەرگەی لیوای یەکەی پیادە بوو.

ئەو هۆکارانەی کە بوو بە گرتنی بەشیر:-

١- نەبوونی تەقەمەنی پێویست بۆ بەردەوامی شەڕکردن بەتایبەتی ئاستی چەك و تەقەمەنییەکان کە لە ئاستی ئەو چەکانەی ئەواندا نەبوو.

٢- بێ هێزی لایەنە سەربازییەکان و لە ئاستی پێویستیدا نەبوو ئەو جۆرە شەڕانە.

٣- نەگونجاندنی تەرازووی هێزەکان لە هەردوولا، بە تایبەتی پێشمەرگە وەکو پێویست و بە توانایی ڕێك نەخرابوو.

٤- هێزە شیعییەکان لەو ناوچەیە دەوریان هەبوو لە بەرگری نەکردنی ناوچەکەدا.

لە ڕۆژی (٢٩)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠١٤) چەند فەرماندەیەکی هێزە شیعەکان بە یاوەری دوو ڕاوێژکاری ئێرانی هەوڵیاندا هێرش بۆ گرتنەوەی گوندی بەشیر، لە سەرەتا هێرشەکەیان لە گوندەکانی (شەمسیە، مەرعیە، بەشیر) هێرش بکەنە سەر دووژمن لە کاتژمێری (٢٠٠) هێرشیان کردە سەر هەردوو گوندی (شەمسیە، مەرعیە) سەرەتا سەرکەوتنیان لە ناو گوندی (شەمسیە) بەدەستهێنا، لە گوندی (مەرعیە) کەوتنە کەمینی دوژمنەوە، هێزەکەیان شکا، نزیکەی (٣٠) شەهیدیان دا، لە دوایدا هێرشی پێچەوانەی داعش دەستی پێکرد و لەگەڵیاندا هێزی پێشمەرگەش بەرگری کرد تا توانرا هێرشەکانیان تا گوندی (شەمسیە) ڕابگرن، کوژراوی دووژمن زیاتر لە هەشتا کەس بوو، تورکمانە شیعەکانیش زیانی زۆریان بەرکەوت.

لە ڕۆژی (٣)ی تەمووزی ساڵی (٢٠١٤) لەسەر ڕێگای گوندی بەشیر شەڕ دەستی پێکرد، لەسەر هەردوو لیوای دوو و سێی تایبەت، بەوپەڕی تواناوە بەرگریان کرد شەهیدو برینداریان هەبوو.

*** شەڕی (تەللوەرد):-**

لە ڕۆژی (١٥)ی تەمووزی ساڵی (٢٠١٤)، داعشەکان لەناو گوندی (دور الکهرباء) دەیانویست بۆ سەر ئاوەکە سەنگەر لێبدەن، بەوەش ڕێگای هاتووچۆی بەرزاییەکانی (تەللوەرد) دەکەوێتە مەترسییەوە، تەقە لە هەردوولا دروست بوو، داعش کوژراویان هەبوو.

لە کاتژمێری (٧٠٠) لە هەموو لایەکەوە، شەڕ دەستی پێکرد، دوژمن لە چەند قۆڵێکەوە پەلاماری (تەللوەرد)و پردی (مەکتەب خالید)ی دا، شەڕێکی قورس ڕوویدا، شەهیدو بریندار لە هێزی پێشمەرگە زۆر بوو، بەڵام دووژمن لە هەموو لایەکەوە شکاو کوژراوی زۆر بوو، شەڕەکە تا کاتژمێر

(١٤٣٠)ی خایاند.
لە ڕێگای عەشایەرییەوە داوا لە هەردوولا کرا شەڕەکە ڕابگرن، بۆیە عەقید (تەیب)و عەمید (لوقمان)و عەقید (سیروان) بە چەکەکانیان پردی فەتحەی موسڵیان بۆردوومان کردو بە ووردی ناو گوندی (سوڵتان مەرعی)و پردەکەیان کردە ئامانج، زیانی زۆر بە دوژمن گەیشت، بۆیە داوای ڕاگرتنی شەڕەکەیان کرد.
لەسەر قسەی ئەوان هێزی پێشمەرگە تەقەیان ڕاگرت، بەڵام نامەردانە هاوەن بارانی سەنگەرەکانی پێشمەرگەیان کردو، هاوەنێك کەوتە ناو سەنگەری عەمید (شێرکۆ فەتاح) و بەسەختی بریندار بوو، شەهیدو برینداری تریان دا، بە بریندار بوونی عەمید شێرکۆ پەشێوی کەوتە سەنگەرەکانەوە، بەڵام لە دوایدا هێزی تر جێگەی ئەو هێزانەی گرتەوەو توانرا سەنگەرەکان بەباشی ڕێك بخرێتەوە.
ڕۆژی (١٧)ی تەمووز لە ساڵی (٢٠١٤) لە تەنیشت کارەباکەی (مەلا عەبدوڵڵا)، ئەنوەر حاجی عوسمان هات و بەو سیفەتەی تەللوەرد لەسەر میحوەری پێنج بوو دەیانویست لیوای دوو لە تەللوەرد جێگیر بکەن و تیمێکی سەربازی لە وەزارەتی پێشمەرگەی بۆ تەللوەرد هێنابوو.
ئەنوەری حاجی عوسمان بە پێشمەرگەی ووت، کە گوایە داعش ڕێگای نەداوە بەردی سەنگەرسازی بەبار هەڵگر بگوازینەوە، پێی ڕاگەیاندن، کە وەفدێکی تایبەت لە (مەسیفە)وە دێت بە مەبەستی گفتوگۆ لەگەڵ نوێنەرانی داعش بۆ ڕێکەوتن.
وەستا ڕەسوڵ لە یاداشتەکانیدا بەم شێوە باسی ئەو وەفدە دەکات:-
" کاتژمێر (١٤٠٠) عەمید بەشدارو کەسێکی مەدەنی هاتنە لامان بەناوی سەرۆکی هەرێمەوە قسەی لەگەڵ کردین، بە تەلەفۆن دانیشتنەکەی ڕێکخست و وەفدەکەی پێشمەرگە پێکهاتبوو لە عەمید بەشدار، عەمید هیوا ڕەش، عەقید وریا شێخ حەسەن، کەسێکی مەدەنی لە هەولێرەوە هاتبوو ناوەکەیم نەدەزانی وا ڕێکەوتبووین لەو بەری پردی مەکتەب خالید کۆببینەوە، من لەناو ئۆتۆمبیلێکی باجەری گەورە لەم بەری پردەکەوە لەگەڵ فەرماندەی لیوای (دە)، عەمید فاتیح گەورە دێی بە دووربینی چاودێریم دەکردن و بە تەلەفۆن لەگەڵ هیوا ڕەش لەسەر خەت بووم، وەفدی داعش لە سێ کەس پێك هاتبوو ئەم داوا کاریانەیان هەبوو:-
١- چۆڵکردنی تەللوەرد واتا ئەو بەری ئاویان بەهی خۆیان دەزانی.
٢- کردنەوەی ڕێگای (حەویجە - کەرکوك)
٣- ڕەفتاری بازگەکان باش بکەن.
٤- پارێزگاری کەرکوك سووتەمەنی و ئاوو کارەباو خزمەت گوزاریمان بۆبنێرێت.
٥- بەند کراوەکانمان بەر بدەن.
٦- ڕێگامان بدەن ڕافزییەکان لە (تازە)و (داقوق) بکوژین.
منیش بەم شێوەیە وەڵامیانم دایەوە:-
١- (تەللوەرد) چۆڵ ناکەین.
٢- ڕێگاتان نادەین بێنە ناو (تازە)و (داقوق)، هەموو دانیشتووانی ئەم سنوورە لە ئەستۆی ئێمەن بۆ کەس نییە بیانکوژێت.
٣- هەر کەسێ لەو بەند کراوانەش لە دادگا حوکم درابن، هەر دەبێت بە یاسا ئازاد بکرێت، واتا ماوەی بەندکردنەکەیان تەواو بکەن ئەمجا بەر دەبن.
٤- بۆ مەسەلەی کردنەوەی ڕێگاش، سەیری ڕەفتاری ئێوە دەکەین، تەقە لە پێشمەرگە بکەن ڕێگا ناکەینەوە، بزانین چەند ڕۆژێك ڕەفتارتان چۆن دەبێت. لەم خاڵەیان کات بۆ ئێمە زۆر گرنگ بوو تا بتوانین لە سنووری بەرزاییەکانی تەللوەرد سەنگەرسازییەکان تەواو بکەین.
٥- دەربارەی ڕەفتاری بازگەکان، باشە قسەیان لەگەڵ دەکەین.
٦- دەربارەی خزمەتگوزاری پەیوەندی بە ژیانی خەڵکەوە هەیە، لەگەڵ پارێزگار قسە دەکەین.
دانیشتنەکە کۆتایی هات و وەفدەکە گەڕانەوە، عەقید (وریا) بە توندی قسەی لەگەڵیان کردبوو، عەمید (بەشدار) ئەمەی پێناخۆش بوو گازندەی لە عەقید (وریا) کرد.
عەمید بەشدار ووتی:- "من لە موسڵەوە بە سەنگەرەکاندا هاتووم، هەوڵی زۆرم داوە بۆ ئاگر بەست لە نێوان هێزی پێشمەرگەو دووژمن، ئەگەر لێم تێکنەدەن تاجەلەولا شەر ڕادەگرم، من لەلایەن سەرۆکی هەرێمەوە بۆ ئەو مەبەستە تەواو سەر پشك کراوم.

*** داگیرکردنی نەوتی (بای حەسەن):-**
شەوی هەژدە لەسەر نۆزدەی تەمووزی ساڵی (٢٠١٤)، هێزێکی تایبەتی لیوای یەکی پاسەوانی نەوت و گاز لە هەرێمی کوردستان بە فەرماندەیی (نەجاتی عەلی غانم) لێپرساوی لقی مەخمووری پارتی دیموکراتی کوردستان پەلاماری کۆمپانیای نەوتی بای حەسەنیان دا لە (دووبز)، هەموو پۆلیسەکانی نەوت کە سەر بە عێراق بوون لە کۆمپانیای نەوت دەرکران و ڕەوانەوەی ماڵەوەیان کرد، ئەم ڕەفتارە کاردانەوەی زۆری لێکەوتەوە، بەڵام لە دوایدا دەرکەوت کە ئەم ڕێکەوتنی نێوان وەزارەتی سامانە سروشتییەکانی هەرێمی کوردستان و وەزارەتی نەوتی عێراقە.

*** هاتنی وەفدی ئەمریکی بۆ شەرگەکان:-**
ڕۆژی (٢٥)ی تەمووزی ساڵی (٢٠١٤) بۆ یەکەم جار وەفدێکی ئەمریکی بێتە سنووری کەرکوك لە میحوەری چوار لەسەر هێڵی شەمەندەفەرەکە. هەریەکە لە وەستا ڕەسوڵ و عەمید روکن مەریوان، عەقید خالید، عەقید وریا لەگەڵ وەفدەکە کۆبوونەوە، بە ووردی باسی چۆنێتی دابەشبوونی هێزەکانیان بۆ کردن، نەخشەی دابەشبوونی چەکە گەورەکان، سەنگەرەکان، شەرەگەی پێشمەرگە، دووژمن، هەموو شوێنەکان.

*** هێرشی دووژمن لەسەر ڕێگای (بەشیر):-**
لە (٢٦)ی تەمووزی ساڵی (٢٠١٤) لە کاتژمێری(٠٠ ١٤) دوژمن پەلاماری هێزەکانی لیوای سێی تایبەتیان دا لەسەر ڕێگای (بەشیر)، لەلایەن هێزەکانی لیوای سێی تایبەت و

نووی تایبەت و هێزەکانی پشتیوانی دوو بە پەرچدرانەوە، شەهیدو بریندارمان هەبوو، دوژمن بە کوژراو بریندارەوە تێکشکێنرا، شەرەکە دوو کاتژمێری خایاند، پێنج گوولە هاوەنی دووژمن کەوتنە ناو گەرەکی (عەمێلری) لە ناحیەی تازە، بریندار لە خەڵکی سڤیل هەبوو.

*** هاتنی (گەریلا) بۆ کەرکوك:-**

١٠٠ هەڤاڵی گەریلا لە قەندیل و مەخموورەوە هێنرانە فرۆکەخانەی کەرکوك و بەرەو گوندی (مەتارە) بەڕێکخران، لەسەر ڕێگای گەرەکی پیشەسازی دوو بۆمبیان پێدا تەقیەوەو بریندارێکیان دا، ڕێگای پیشەسازی تازە زۆر مەترسیدار بوو، بەردەوام بۆمبیان لەو ڕێگایە دادەنا.

ئەو هێزەی (گەریلا) لە رووی مەعنەویەوە بۆ کەرکوك زۆر باش بوو، لە هەمان کاتدا ڕێگای گوندی (وەحدە) یان پێسپێردرا، بەشێك لە هێزەکەیان لە گوندی (عەبدوڵڵا غانم) جێگیر کران.

بۆ ئەو ڕۆژانەی سنووری کەرکوك هێزەکەی پەکەکە گرنگی خۆی هەبوو، لە لایەکەوە یەك ریزی کوردی نیشان دەدا، لەلایەکی ترەوە هێزێکی ئازا بوون لە سنووری (داقوق)، پشتیان پێدە بەسترا.

*** هێرشی (داعش) بۆ سەر ناحیەی (تازە):-**

لە ڕۆژی (٢٢)ی ئابی ساڵی (٢٠١٤) بە مەبەستی داگیر کردنی ناحیەی (تازە) دووژمن پەلاماری سەر ڕێگای بەشیری دا.

پێشمەرگە بوێرو ئازاکانی هێزی پشتیوانی دوو بە فەرماندەی عەمید روکن (سەلیم)و (عەمید روکن ڕێبوار)و هەردوو لیوای دووی تایبەت و لیوای سێ تایبەتی هەڤاڵ کۆسرەت، لە شەرێکی قارەمانانەدا دوژمنیان تێکشکاندو کوژراوی زۆریان هەبوو.

*** تەقینەوە:-**

رۆژی (٢٢)ی ئابی ساڵی (٢٠١٤) تەقینەوەیەکی بەهێز لە بارەگای هێزەکانی بەرگری و فریاکەوتن لە ڕێگای بەغدا روویداو شەش پێشمەرگە شەهید بوون.

هێزەکانی بەرگری و فریاکەوتن، (کاکە مەند حاجی کاکە رەش) فەرماندەییانی دەکرد لە جەلەولاوە تا کەرکوك دابەش ببوون، لەناو کەرکوك زۆربەی بینا بەرزەکانیان کۆنترۆڵ کردبوو.

زۆربەی فەرماندەو پێشمەرگەکانی فریاکەوتن لەو فەرماندەو پێشمەرگانە بوون کە پێشتر لە هەموو شەرەکاندا بوون و زۆر ئازا بوون.

*** هێرشی (وەحدە).**

ئەم هێرشە لە (٣٠)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠١٤) دەستی پێکرد لە بیرەوەرییەکانی وەستا رەسوڵ بەم شێوەیە باسکراوە:-

(.. لە ڕێگای عەمید روکن (مەریوان)ەوە زانیم کە هێرشەکانی سنووری (خورماتوو) یەك ڕۆژ دواخراوە، بە تەلەفۆن بە هەڤاڵ شێخ جەعفەرم ووت:- کە ئێمە هێرشەکە دوابخەین، ووتی وەڵامت دەدەمەوە، پاش دە دەقیقە وەڵامی دامەوە، ووتی :- فەرماندەکان دەڵێن تازە هێزەکانمان بەرێخستووە، ناتوانین دوای بخەین).

لە کاتژمێری (٣٠٠) بە خۆم و هێزەکانمەوە بەرێکەوتین بەرەو گوندی (مەتارە)، هێزێکی تایبەتی مەڵبەند بە فەرماندەیی رائید قادر، هێزەکانی گەریلا لەناو گوندی وەحدە بوون، لیوا (حەمە هەژار)یش چوونەتە ناو گوندی (سەعدەوە) لە کاتژمێر (٥٠٠) تەقە لە گوندی (وەحدە) دەستی پێکرد، بە دۆشکەو دووره تەقە لە رەبییەکەی سەر ڕێگای وەحدەیان دا، لەوێ زانیم تەنها هێزەکانی (گەریلا) چوونەتە ناو بەشێ لە گوندەکەوە.

لە کاتژمێر (٦٠٠) بەکر بیوکەیی ئاگاداری، کردم کە ئەوان گەیشتوونەتە ناوی گوندی (خالید)و تەقەیان تووش بووە، واتا نەخشەکە لە کرداریدا جێبەجێکرا، شەری وەحدە گەرمتر بوو، گەریلا هێرشیان کرد، فەرماندەکەیان بە ناوی هەڤاڵ (مەروان) شەهید بوو، کەمێ کشانەوە ناوەراستی گوندەکە. گەریلاکان نەیاندەتوانی رەبیەیی سەر ئاوەکە بگرن لە گوندی وەحدە، هێرشی رووبەرووش شەهید زۆر دەدەین.

فەرماندەکانی گەریلا زۆریان هەوڵدا بۆ کۆنترۆڵ کردنی تەواوی گوندەکە، بەڵام شەری قەناس و زۆری بۆمبرێژکراو نەیانتوانی نیوەی گوندەکە کە بەدەستی دووژمنەوە بوو کۆنترۆڵ بکەن.

شەرگەرم بوو لە هەرسێ گوندی وەحدە، سەعدە، خالید، دژە هێرشی دووژمن لە هەموو لایەکەوە دەستی پێکرد، پێشمەرگە تووشی شەری دەستەویەخە بوونەوە، ئۆتۆمبێکی دووژمنیان سوتاندو دووژمن کوژراوی زۆری هەبوو، لەناو گوندی خالیدیش پێشمەرگە شەری قورسی لەسەربوو، شەهیدو بریندارمان هەبوو، هێزەکانی پێشمەرگە لە گوندی عەبدوڵلاغانمەوە بەرگری بێ وێنەیان کرد.

هێزەکانی پێشمەرگە لە گوندی (خالید) شکان و بەشێوەیەکی نارێك پاشەکشێیان کرد، لە کشانەوە شەهیدێ زۆریان دابوو، بە گەیشتنی هێزەکانی داعش لە دەرەوەی گوندەکە دەوریان گیرا بوو بەداخەوە زۆربەی پێشمەرگەی کەمینەکەیان کە نۆ کەس بوو شەهید بوو، فەوجەکەی (بەکر بیوکەیی) لە کشانەوەیان سێ شەهیدی هەبوو.

هێزەکەی لیوای سەدو شەش بەشێوەیەکی ڕێکوپێك کشابوونەوە، شەهیدیان نەبووە، شەری قورس هاتەوە سەر گوندی (وەحدە)، عەمید (سەرحەد) لە هێرشەکەی کاتژمێر (١٢٠٠) بەشدارنەبوو، بەڵام لە کەناری ئاوەکەوە خۆی هێرشی بە فەرماندەو پۆلیسەکانی کردبوو وە هەندێك خۆبەشی لە گەڵدا بوو، بەڵام لە سەرەتادا سەرکەوتن بەڵام بۆمبێکی گەورەیان پێدا تەقیەوە بووە هۆی شەهید بوونی کۆمەڵێك پۆلیس و خۆبەخش، شکاوگەرایە دواوە، دژە هێرشی دووژمن زیادی کرد، بەڵام توانرا هێرشەکە لە هەموو لایەکەوە، رابگیرێت، بەڵام خاکمان نەدا بەدەستەوە هێزی پێشمەرگە شکا.

لەم شەرەدا بە پێشمەرگەو پۆلیس و خۆبەخش بیست و دوو شەهیدماندا، ١٤ پێشمەرگە، (٥) پۆلیس، (٣) خۆبەش، زیانێکی زۆریان بەرکەوت، گەرچی دووژمن کوژراوی زۆر

بوو.

*** هۆکاری شکستەکەی شەڕی گوندی (وەحدە):-**

١- کێشە لە نەخشەو پلان نەبوو، لەبەر ئەوەی هێزەکان بەبێ تەقە چوونە ناو گوندەکانەوە.

٢- لە مەیدانا فەرماندە مەیدانییەکان وەکو پێویست هێزەکانیان دانەمەزراندبوو لە شەڕ، لەبەر ئەوەی شارەزایی تەواویان لە شەڕی داعشدا نەبوو، یەکەم جار بوو بەبێ پشتیوانی فڕۆکە پێشمەرگە شەڕ بکات.

٣- نەگرتنی گوندی (وەحدە) لەلایەن گەریلاوە، وایکرد ڕێگا نەکرێتەوە ئامێرو زرێپۆش بگاتە هەرسێ گوندەکە.

٤- هێزی یەدەك لە سنووری گوندی (خالید) نەگەیشتبووە فریای هێزی ناو گوندەکە.

٥- لە ڕووی ئیدارییەوە هەموو پێویستییەك دابەشکرابوو، بەڵام هەر ئەوەندە تەقەمەنیان لەگەڵ خۆیان برد بوو بە کۆڵ.

٦- تۆپۆگرافیای زەوییەکە زۆر خراپ بوو، پڕ بوو لە قامیشەڵان و حەوزی ماسی زۆر.

٧- دوژمن لە سنوورەکە لە هێزەکانی ئێمە شارەزاتر بوو.

*** شەڕ لەسەر هێڵی شەمەندەفەرو نەهرەوان:-**

ڕۆژی (١٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠١٤) لە کاتژمێری (١٢٠٠) چەتەکانی داعش دەیانویست لەسەر ڕۆخی ئاوەکە سەنگەرییان بهێنە پێشەوە، بۆیە هێزی پێشمەرگە بە فەرماندەیی لیوای یەکی سنووری فەوجی سێ، دەستێکی چاکیان لە دوژمن وەشاند، لەو شەڕەدا جێگری فەوج بە سەختی بریندار بوو، هەروەها شەهیدیانش هەبوو، بەناوی نەقیب قادر ئەحمەد، لەناو بارەگای لیوای سەدو شەش نەقیب (ڕەنگین یوسف) شەهید بوو.

*** شەڕی دووەمی (تەللوەرد):-**

لە شەوی (٢٥ لەسەر ٢٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠١٤)، کاتژمێر (٢٠٠) دوژمن پەلاماری بەرزاییەکانی تەللوەردیان دا کە لیوای شەشی پیادەی لێبوو بە فەرماندەیی عەمید (سەید ساڵح)، لە قۆڵی مەکتەب خالیدەوە پەلاماری سەنگەرەکانی فەوجی یەکی لیوای یەکیان دا.

لە کاتژمێر(٣٠٠) بەهێزەکانی ئامادەیی میحوەر بە فەرماندەیی عەلی چیمەنی و ڕائید مەحمود مەرزیخەو هێزە تایبەتەکەی مەڵبەند بە فەرماندەیی ڕائید قادرو شەوقی مۆرخواردەیی و عاسی مۆرخواردەیی گەیشتنە پردی (تەللوەرد)، لیوای شەش سەنگەرەکانی پێشەوەیان لە بەرزاییەکان چۆڵ کردبوو، دوژمن هاتبووە ناو سەنگەرەکانیانەوە، هێزەکانی لیوای شەشی کشانەوە، ئەوانیش لە قۆڵی ڕاستی پردەکە لەناو سەنگەرەکان دامەزران، دوژمن بۆ سەر هێرشی هێنا، شەڕی دەستەویەخە دەستی پێکردو شەڕ گەرم بوو، لەسەر لیوای یەکیش شەڕ گەرم بوو لە پاش سێ سەعات شەڕ لە کاتژمێر (٧٠٠) هەمەرێکی بۆمبڕێژکراویان بۆ ناردن، لە ناوەڕاستی پردەکە بە دۆشکەی فەرەنسی لەلایەن عەدەد دۆشکەیەك بەناوی (محەمەد عومەر) لە هێزە تایبەتەکەی هەڤاڵ ئاسۆ مامەند تەقێنرایەوە، بەداخەوە لەگەڵ هەڵسانی شەهید بوو، شەڕ بەردەوام بوو لە کاتژمێر (٨٠٠) هەمەرێکی تر پڕ تەقینەوە هێرشیان کردە سەرمان، لە دووری (٥٠) مەترەوە بە (ئار. پی. جی) تەقێنرایەوە، لە ناوەڕاستی پردەکە تەقییەوە.

ژێر پردەکە بۆری نەوتی پیا تێدەپەڕی لە کەرکوکەوە بۆ بێجی، نەوتی قەتیس ماوەی ناو بۆرییەکە گڕی گرت، ئاگرەکە ووردە.. ووردە بەرزبۆوە لە پڕێکدا بە دەنگی گرمەیەکی گەورە نزیکی (١٠٠) مەتر ئاگر بۆ ئاسمان بەرز بۆوە، زیانی زۆری بە ئۆتۆمبیلەکان گەیاندوو دوانیان لەوێ سووتان، بە دەیان ئۆتۆمبیل لە سنووری لیوای شەش سووتان، (٤٢) پێشمەرگە لای هێڵی شەمەندەفەرەکە بریندار بوون، لە قۆڵی ڕاستەوەش بە هەمان شێوە فەرماندەی لیوای شەش و ژمارەیەکی زۆر پێشمەرگە بریندار بوون.

گڕی ئاگرەکە بڵاوی داعش زیاتر بوو، ئەوانیش لە سەنگەرەکان لەناو ئاوەکە هەڵسان و ڕایان کرد، بە ناچاری داعش لە بەرامبەرمان کشایەوە، بەڵام شەڕ بەردەوام بوو لەمبەری ئاو بۆ بەرزاییەکانی (تەللوەرد) کە داعشی بەسەرەوە بوو.

بەڵام جارێکی تر بەرنامەی تازە دارێژرایەوە بۆ گرتنەوەی (تەللوەرد) سەعات سفر لە کاتژمێر (١٦٠٠)، دەستی پێکرد، دژە تیرۆر چوونە ناو گوندی (مەکتەب خالید)، هێزەکەی عەمید شێرکۆو گەریلاکان لە ماوەی (٣٥) دەقیقەدا گەیشتنە بەرزاییەکانی تەللوەردو کۆنترۆڵیان کرد، مولازم هاشم بنەیی لێپرسراوی دەستەی عەمید شێرکۆ شەهید بوو، هەڤاڵ بەدرخان لە هێزەکانی گەریلا چاوێکی لە دەستدا زیانی ئەم شەڕە (٨) شەهیدی پێشمەرگە بوو، بووە شەهید بوونی عەمید عەلی ئاغای غەفووری و عەتا کوڕی محەمەدی حاجی مەحمود.

لەم شەڕەدا فڕۆکە جەنگییەکانی هاوپەیمانان بۆردومانی دوژمنیان بە باشی کرد لە تەللوەرد تا حەویجە، کە نزیکەی (٢٠٠) داعشیان کوشتووەو ئۆتۆمبیلی هەمەری سەربازی سووتێنراوە.

*** هێزی (دژە تیرۆر):-**

ئەم هێزە چەندین فەرماندەی لێوە شاوەی تیا کۆبووەتەوە، لەسەر بنەمایەکی زانستی سەربازی مەشق و ڕاهێنانی باڵایان ئەنجامداوە، چەکی سووك و مام ناوەندی پێویستیان پێیە، هەر لە سەرەتای شەڕەکانەوە لە پێشەوەن، لە مەخموورەوە تا دەگاتە جەلەولا بە سەرکەوتووانە بەشداری شەڕەکانیان کردووە، بەتایبەتی لە شەڕەکانی پێشمەرگە لە کەرکوك لە دژی داعش، بەتایبەتی لە شەڕەکانی تەللوەرد، مەکتەب خالید، ڕێگای ڕەشاد، پردی نەهرەوان، گوندەکانی لای خەبازە، گوندی مورە، گوندی عوزێریە، گوندی ئەلبونەجم.

*** ئەرك سپاردن بە هێزی (حەشدی شەعبی):-**

بۆ یەکەم جار لە ڕۆژی (٣)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠١٤) لیوایەکی (حەشدی شەعبی) لە تازەو داقوق و بەشیر دروست کرابوو کە لە (٨٥٪)ی لە تورکمانی شیعە مەزهەب بوون،

لە مەشق تەواو بوون‌و ئەرکیان لە کەناری پرۆژەی ئاوەکە وەرگرت، ئەوان چەندین دۆشکای سەر ئۆتۆمبیلیان لابوو، کەوتنە ژێر فەرمانی میحوەری چوارەوە.

*** هێرشی (ڕەشاد):-**

هەر لە ڕۆژی (١٠)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠١٥)، هێزی پێشمەرگە لە ڕێگای بێتەلەکانی داعشەوە، کە دیار بوو کارێکیان بە دەستەوە بوو، زانیارییان وەرگرت، کە لە شوێنێکەوە بە تەمای پەلاماری هێرشن بۆ سەر پێشمەرگە لە کاتژمێری (٥٠٠) لەسەر پردەکەی ڕێگای (ڕەشاد) پەلاماری فەوجی دوویان دا بە فەرماندەیی عەمید (تالیب)، کە بۆ ماوەی یەك کاتژمێر شەڕ بەردەوام بوو، کە نەیانهێشت بێنە پێشەوە، بریندارایان هەبووە، بەڵام شەهیدیان نەبوو، هەر لە هەمان کاتدا شەڕ لەسەر ڕێگای (بەشیر - تازە) گەرم بوو، هێرشی دوژمن لە سنووری گوندی (وەحدە) بۆ گوندی (عەسری)یەوە دەستی پێکرد، بەڵام نەیانتوانی دوژمن بێتە پێشەوە.

*** داستانی پارێزگاری لە کەرکوك:-**

لە شەوی ٣٠ لەسەر ٣١ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠١٥) لە ئێوارەوە سەرچاوەکان بە پچڕ.. پچڕ هەواڵیان دەدا کە دوژمن جموجوڵی هەیە، ئەم نامەو هەواڵانە بەردەوام لە شەواندا دەهات.

لە شەوی (٣١)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠١٥)، بە پێی سەرچاوەکان، داعش خەریکی بەکارهێنان بوون بۆ لێدانی ساتر لەسەر ڕێگای مەلا عەبدوڵلاو لادانی ساترەکانیان.

لە کاتژمێری (١٣٣٠) دوژمن لە هەموو لایەکەوە پەلاماری سەنگەرەکانی پێشمەرگەیاندا، لە مەلا عەبدوڵلاو بیوتەرەوە کە لیوای یانزەی میحوەری پێنجی لێبوو سەنگەرەکانی پێشمەرگەیان بری‌و لە ئاوەکە پەڕینەوە، هێزەکانی ئەو سنوورە شکان، لە نەهرەوانەوە پەلاماری فەوجی چواری لیوای یەك درا لە میحوەری چوار لە ئاو پەڕینەوە، لە ڕەشاد هێرشیان کرد لە تەللوەرد هێرشیان کرد، هێرشەکان بە ئۆتۆمبیلی گولە نەبڕ بوو، جۆری لە ئۆتۆمبیلی بارهەڵگریان بە تەواوی کرد بوو بە گوللەنەبرو پلێتی ئەستورو زۆریان لێدا بوو، بە جۆرێك کە هیچ چەکێك نەیدەبری، بۆ کردنەوەی ڕێگاکان شۆفڵی گوللە نەبریان دروست کردبوو، ئارپیجی کاری تێ نەدەکرد، لەو جێیانەوە بە هۆی ئەو ئامێرە گوللە نەبرانەوە لە سەرەتای شەڕەکەوە توانیان هێڵی پێشەوەی سەنگەرەکانی پێشمەرگە ببڕن.

دیارە کۆمەڵگەی نەهرەوان دەکەوێتە ئەو بەری پرۆژەی ئاوی کەرکوك. بارەگای سەرەکی داعشی لێبوو، بەردەوام بە هاوان لە هێزەکانی پێشمەرگەیان دەدا، پردێکی لێبوو بۆ پێشگری ئاوەکە دروست کرا، لەو پردانە بوو کە دەبووایە پێشتر بڕوخێنرایە، دوژمن لەو بەری ئاوەکەوە شۆفڵێکی تایە زنجیر بە پلێتی (١٦) ملم کردبوو بە گوللە نەبڕ، دووقەناس بە دەست لە سەرەوە تەقە دەکەن، چەند کەسێکیش بەپێ یاوەری دەکە، سەنگەری خۆیان لەسەر ڕێگاکە لابرد بوو، نێوان هەردوو ساترەکە تەنها (٥٠) مەتر دەبوو، یەکسەر هاتبووە سەر سەنگەری پێشمەرگەو شەری دەستەویەخە تێکەڵاوبوون لە نێوان داعش‌و پێشمەرگەکانی فەوجی چواری لیوای یەکی دروست ببوو موقەدەم (ڕاستی) یاریدەدەری فەوجەکەیان لەوێ بوو بە تەلەفۆن بە عەمید (شێرکۆ فاتیح) فریامان کەوە شەڕی قورسمان لەسەرە، لە هەمان کاتدا موقەدەم (شێخ عومەر) بە تەلەفۆن داوای لە عەمید (شێرکۆ) کرد بوو هێزی فریا بخات، بۆیە لەم شەڕەدا عەمید شێرکۆ شەهید بوو.

خۆی‌و دەستەکەی چووبوون بە دەنگ شەڕەکەی نەهرەوانەوە، چاوەڕێی تانك‌و زرێپۆشەکانی نەکردبوو بگاتە لایان، یەکسەر بە ئۆتۆمبیلەکانیەوە چووبووە ناو ئەو خانووەی سەر پردەکە. پێیان نەووتبوو دوژمن لە ئاوەکە پەڕیوەتەوە، لەو دیوی سەنگەری پێشمەرگەوەن، کە دابەزیبوو لە ئۆتۆمبیلەکە هێرشی کردبوو بۆ سەر دووژمن، قەناس بە دەستی سەر شۆفڵەکە تەقەی لێ کردبوو فیشەکێك بەر سەری کەوتبوو، بە ئازایەتی دەستەکەی خۆی توانیبوویان تەرمەکەی دەربکەن لەگەڵ عەمید شێرکۆ چەند پێشمەرگەش شەهید بوون، بەشەهید بوونی شێرکۆ سنووری فەوجی چواری لیوای یەك کەوتە دەستی دوژمن کە شوێنێکی زۆر هەستیار بوو بۆ سنووری هەردوو فەوجەکانی (٣،٤) لە لیوای یەك کەوتە مەترسییەوە.

وەستا ڕەسوڵ لە بیرەوەرییەکانی ئاواباسی دەکات:-

من لە نزیکی تۆپزاوە بووم هەواڵی شەهید بوونی کاك شێرکۆم بە هەڤاڵ ئاسۆ مامەند ووت. ئەویش زۆر خەمبار بوو، بەڵام کاتی شەڕ بوو، جارێ پێویست بوو باری لاری شەڕەکە ڕاست بکەینەوە. وا ڕێکەوتین کە من هێزە تایبەتەکەی مەڵبەندو هێزمکەی لای خۆم ببەم بۆ گوندی عەسەلییە کەمەترسی لەسەر بوو. کە کاك شێرکۆ شەهید بوو ووتم: من بەم هێزانەوە دەچم بۆ لای فەوجەکانی لیوای/١. ووتی:- باشە من دەچم هێزەکانی لیوای/ ٣ی تایبەت دەبەم بۆ یایچی. من بەڕێکەوتم بەرەو مەکتەب خالید، لە بەردەمی کۆمپانیای (غاز شمال) کاك ئاسۆ پێی ووتم: هێزەکەی مەڵبەند بنێرە بۆ سەر پردەکەی تەللوەرد لەوێ بارودۆخ باش نییە، واتا (٣٠) کەسێك لە دەستەکەی خۆم لەگەڵم مایەوە. فەوجەکەی عەلی چیمەنیم نارد بۆ ڕێگای ڕەشاد کە لەوێشەوە دوژمن دەستی کرد بە هێرش‌و دەیوست پردەکە بگرێت بێتە ئەمبەرەوە. داوام لە عەمید هیوارەش کرد بە هێزێکی تایبەتی لیوای/ ١٣٤و فەوجەکەی عەلی چیمەنی بەرەو پردی ڕەشاد بڕۆن. من بەرەو هێڵی شەمەندەفەرەکە کەوتمە ڕێ. هێزێکی تانك‌و زرێپۆشی لێبوو لە هێزەکانی پشتیوانی دوو. لەوێ مام چالاکم بینی جێگری فەوجی/ ٣، لەو کاتەدا عەمید سعود خالۆ بازیانی فەرماندەی فەوجی /٤ لە مۆڵەت بوو هاتەوە. لەگەڵ عەمید ڕەفیق قسەم کرد تا هێرشێك بەرەو نەهرەوان بکەین. ووتی: زۆر تاریکە چاومان نابینێ، بەتانك هیچ ناکرێت تا ڕۆشن نەبێتەوە. ئەو شەوە تەمومژێکی زۆر بوو، لەگەڵ ئەوەی تاریکیش بوو عەمید ڕەفیق ئامادەیی دەربری بۆ هێرش بردن. بەڵام وەکو هێزمان لە هێڵەکە نەبوو تا لەگەڵ تانکەکان بڕوات. لەگەڵ مام چالاك

قسەم کرد ووتم: ئەو جێگەیە بە تۆ دەسپێرم، من دەچمە لای فەوجی یەك لە پردەکەی مەکتەب خالید فشاریان زۆر لەسەربوو، ووتی: دڵنیابە جێی ناهێڵم.
لە سەنگەرەکانی مەکتەب خالید دامەزراین، شەر گەرم بوو لە کاتژمێر (٥٠٠)ەوە لە هەموو لایەکەوە هەرەسی هێزکانمان دەستی پێکرد. عەمید هیوا رەش لە رێگای رەشاد، ئاگاداری کردم کە ئەوان شکان و جێگەی خۆیان بە جێهێشت. دیار بوو لە قۆڵی نەهرەوانەوە کە فەوجی چوار شکابوو گوندی تیبە کەوتبووە دەستی دوژمن، گوشاری زۆر کەوتبوو سەر فەوجی دوو لە رێگای رەشادو ئەوانیش شکابوون.
لە تەللوەرد عەمید سەید سالح فەرماندەی لیوای /٦ تا ئەو کاتە بەرگری باشیان کرد، ماوەی (٣) کاتژمێر لە شەردا بوون، بەهۆی گوشاری دوژمن لە دوولاوە لەناو گوندی (دور کارەبا) و لە بیوتەرەوە دوژمن بەناو سەنگەرەکانی پێشمەرگەدا هاتبوونەوە پشتیان، ناچار بوون تەللوەردیان بە جێهێشتبوو رائید قادر فەرماندەی هێزە تایبەتەکەی هەڤاڵ ئاسۆ مامەند لەسەر پردەکەی تەللوەرد بوو، ووتی منیش شکاوم و کشاینەوە.
ئەم هێزانە بەسەر فەوجی یەکی لیوای/ ١ دا شکان و ورەی ئەوانیش دابەزی. تا ئەو کاتە قارەمانانە شەریان دەکردو پێشیان بە دوژمن دەگرت، نەیانهێشت دوژمن لە پردی مەکتەب خالید بێتە ئەمبەری ئاوەکە. دوژمن دەستی راستی ئێمەی گرت. پەیوەندیم بە هەڤاڵان شێخ جەعفەرو رەفعەت عەبدوڵاوە کرد داوای هێزم لێکردن، کاك رەفعەت ووتی: دژە تیرۆر رۆیشتن بۆ رێگای رەشاد، شێخ جەعفەریش ووتی: عەمید رێبوار فەرماندەی لیوای /١٦ بەرێوەیە بۆلای ئێوە دێن. لیوا نەهرۆ لە قۆڵی یایچی بوو شەری قورسی لەسەر بوو، ووتی وەستا هێزم بۆ بنێرن دەورم گیراوە. ووتم باشە وا کاك ئاسۆ مامەند لە نزیکتە دێتە لات. هەرواش بوو ئەوان پێیان گەیشتن.
عەمید سەلامە رەش فەرماندەی لیوای / ١١٤ لە خەبازە بوو، ئەویش ووتی: شەرم لەسەرە و شکاین. خەبازە زۆر مەترسیدار بوو، کێڵگەی نەوتی لێبوو، زۆریش نزیك بوو لە بارەگای میحوەرەکەمان، ئەو سنوورەش نزیکەی (١٥) گوندی عەرەبی سوننەی لێیە. لە هەموو قۆڵەکانەوە شکان دەستی پێکرد. فەوجی سێ هێڵی شەمەندەفەرەکەیان جێهێشت. لەناو ئەو هەموو شکانەدا لیوا تەها کانی بەردی پەیوەندی پێوەکردم ووتی: برادەران پردی رەشادیان بە جێهێشت و شکان. ووتم: ئەوە چی ئەکەی ووتی: بە حەقی پێغەمبەر من بە جێی ناهێڵم. ئەو قسەیەی لیوا تەها وەکو بروسکەو هێڵی رووناکی وابوو بۆمن. ئەوان بەرگری باشیان کرد. نەیانهێشت هێزەکەی دوژمن لە پردەکە بپەرێتەوە.
زۆری پێنەچوو هێزەکانی دژە تیرۆرو هێزەکانی لیوای/١٣٤ لەگەڵ فەوجی عەلی چیمەنی یەکی لیوای/١ دژە هێرشێکیان کردو توانیان بچنەوە جێگای خۆیان، دوژمن لەو قۆڵەوە شکا.
من لەسەر پردی مەکتەب خالید مامەوە. کات نەدەرۆیی، تا دەهات هێرشەکانی دوژمن زیادی دەکرد. لە هەمان کاتدا لەناو شاری کەرکوك، چەند تیرۆستێك چوونە سەر ئۆتێل قەسر کەرکوك، تەقەیان لە خەڵك دەکرد. باروودۆخی ناو شاری کەرکوك بە تەواوی شێوا بوو، ئاسایش و پۆلیس زوو فریای کەوتن و کۆنترۆڵی ئەو رووداوەی ناو شاری کەرکوکیان کرد.
من داوام لە کاك رەفعەت کرد با هێزەکەی دژە تیرۆر بێتە لای من. لەگەڵ کاك شێخ جەعفەر قسەم کرد کە هێزم بۆبنێرن. مامۆستا لەتیف جێگری فەوجی یەك لیوای/ ١ لەوبەری ئاوی مەکتەب خالیدەوە بوو بەرگری باشی دەکرد قسەم لەگەڵی کرد، کەوا لیوای /٦ لە تەللوەردەوە شکاون و دەستی راستتان بە تەواوی کەوتە دەستی دوژمن، دوای ئەوە فەوجی یەك ناچار بوون کشانەوە. تا کاتژمێر (١٨:٤٥) نەیانهێشت دوژمن لە سەنگەرەکانی بەرگری لەوبەری ئاوەکەوە نزیك بێتەوە، شۆفڵەکەی داعشیان سووتاند. دوژمن نەیتوانی رێگای مەکتەب خالید بکەنەوە. من ویستم هێڵی شەمەندەفەرەکە قایم بکەین. بەشێك لە هێزەکەی خۆم لەسەر پردەکە دانا بەسەرپەرشتی هەڤاڵ عەمیدو هەڤاڵ شەوگەر، کە دووفەرماندەی باڵای گەریلاکانی پەکەکە بوون. بەرگری باشیان کرد. کە چووم بەرەو هێڵەکە دوژمن لە سەنگەری خۆمانەوە تەقەی لێکردین و کە رۆیشتم موقەدەم عەبدوڵڵا جێگری فەوجی یەك لەوێ بوو، پێم ووت: دێمەوە لات، دیار بوو باوەری نەکرد بوو، حەقی بوو چونکە هەموو هێزەکان لە شکان بوو، گەرامەوە ئەویش رۆیشتبوو.
لەسەر پردی مەکتەب خالید مانەوە دوژمن لە سێ لاوە دەوری داین. عەقید رزگار محەمەد ئەمین لام بوو ناردم بۆ لای عەمید رێبوار جێگری فەرماندەی لیوای/ ١٦ کە بە هێزێکەوە بەرێکەوتبوو بێتە لامان. ئەو شارەزانەبوو، عەقید رزگار گەرایەوە بۆلام ووتی: هێزەکەی لیوای/١٦ گەیشتۆتە بازگە کۆنەکە. ئەوە ئازایەتییەکی زۆر بوو رزگار نواندی، کەس نەدەهاتەوە، ئەو گەرایەوە بۆلام. دوژمن هاتنە ناو بارەگای فەوجی یەکی لیوای/١ لە دەستی راستمان واتا لەگەڵ دوژمن تەنها سەنگەرەکەمان نێوان بوو. یەکێك لە هەڤاڵانی پەکەکە بە ناوی هەڤاڵ ئارمانج هاتە لام ووتی: من دەچمە ئەوبەرەوە بریندارێکی لێیە دەیهێنم. بە ئۆتۆمبیلێکی پیکاب لەگەڵ چەند گەریلایەکی کورو کچ رۆیشتن، بریندارەکەیان هێناو هاتنەوە، لەسەر پردەکە لێیان درا. هەڤاڵ ئارمانج و کچێکی گەریلا بەرکەوتن و بە سەختی بریندار بوون. هەردووکیان لەسەریان درابوو، پاشان هەڤاڵ ئارمانج شەهید بوو. گەریلاکان ووتیان: کەس لەوبەری ئاوەکە نەماوە.
شەرەکە زۆر قورس دەبوو، دوژمن بە چەند مەترێك لێمان نزیك کەوتبوون. هەڤاڵ عەگیدو عەقید رزگار ووتیان: با چەند هەنگاوێك بچینە دواوە، لەوە زیاتر ناتوانین لێرە بین. لە کاتژمێر (٧:٢٠) نزیکەی (٥٠٠) مەتر کشاینەوە، تووشی هێزەکەی لیوای/١٦ بووین ئەوان ٨ هەمەریان پێبوو بە جوانی دامەزرابوون. شەر لە دەستی راستیان زۆر گەرم بوو لەو کاتەی ئێمە گەیشتینە لایان، شەری دەستەو یەخەو تێکەڵاوی دروست بوو. فەرماندەی فەوجێك لە لیوای /١٦ بەناوی حەکیم ساتی بەسەختی بریندار بوون پیاوێکی زۆر ئازا بوو، لە دەیان شەر بەشداری کردبوو. ئێمە لە دوای هێزەکانی لیوای /١٦ دامەزراین. کە زانیم دوژمن لە قۆڵی

مەلا عەبدوڵڵاوە زۆر پێشڕەویان کردوە واتە لە دەستی ڕاستمان لە تەواوەتی کەوتبووە دەستی دوژمن. هێزەکەی لیوای /١٦ هەموویان لەناو هەمەرەکانەوە شەڕیان دەکرد. دوو هەمەرەکەی لای منیش لەگەڵ هێزەکەی لیوای /١٦ کەوتنە شەڕەوە، کە هەڤاڵانی یەکەکەو مەفرەزەیەکی لای خۆم بووین. خۆمو دەستەکەم لەگەڵ مەفرەزەیەکی قارەمانی کۆمەڵەی زەحمەتکێشان کە پێشتر لەلایەن کاك عەبدوڵڵای موهتەدییەوە بۆلای ئێمە هاتبوون، ڕوو لە دەستی ڕاست دامەزراین. هەڤاڵانی کۆمەڵە پیاوی زۆر ئازابوون، بە فەرماندەیی عەلی سەیف بوون. شەڕەکە زۆر گەرم بوو، بەلای منەوە ئەوە گرنگ بوو کە کۆمپانیای غازی باکوور نەکەوێتە دەستی دوژمن. لەبەر ئەوەی بکەوتایە دەستی دوژمن بۆ سەرئاسایشی کەرکوك زۆر مەترسی دار بوو.

لەو کاتەدا عەمید ڕێبوار داوای تەقەمەنی لێکردم. مامۆستا کاوەی ئیدارە ئۆتۆمبیلێك تەقەمەنی بۆ ناردبووم، تەقەمەنیەکانم لە ئۆتۆمبیلە گوللە نەبرەکەی خۆم برد بۆ هێزەکەی لیوای/١٦. لەناو گەرمەی شەڕەکە عەمید ڕێبوار پێی ووتم: دوژمن ١٠٠ مەتر لێمان دوورە، بەڵام بەڵێن بێت کارێك بکەم نەکرابێت.

لەسەر ئەوە ڕێککەوتین لە دوولاوە پەلاماری دوژمن بدرێت. هەندێ پیاوی ئازا دەهاتنە وە بۆ لامان. هێزێکی لیوای /٣ی تایبەتی هەڤاڵ کۆسرەت هاتن و هێزێکی تایبەتی هاڤاڵ شێخ جەعفەر هاتن و نەقیب هێرش فەرماندەی سریە لە فەوجی یەکی لیوای /١ هاتن. لەو کاتەدا هێزەکانی دژە تیرۆر بە فەرماندەیی پۆلاد تاڵەبانی و عەمید محەمەد هیدایەت هاتن. لە هەموو لایەکەوە پەلاماری دوژمن درا لە کاتژمێر (٨:٠٠) هێرشی توند کرایە سەر دوژمن. ئەو هێرشە بە فەرماندەیی عەمید ڕێبوار جێگری لیوای/ ١٦ کراو توانیان لە ماوەیەکی کورتدا دوژمن تێك بشکێنن، زیانی گیانی زۆر لە هێزەکەی دوژمن کەوت. کوژراوی دوژمن زۆر بوو دوژمن شکا. توانرا لە ماوەی ٣٠ دەقیقە پردی مەکتەب خالید کۆنترۆڵ بکرێتەوە. لەو هێرشە گەورەیەی بۆ سەرشەرگەکە کردی ئەوە یەکەم شکانی دوژمن بوو. دیارە هێزەکانی دوژمن زۆر بوون، نەخشەکەیان وا بوو کەرکوك بگرن، بەڵام بە شکانی دوژمن لە قۆڵی مەکتەب خالید، هەموو هێرشەکەی دوژمن تێکشکا. هەر لەو کاتەدا هەڤاڵ ئاسۆ مامەندو هێزەکانی لیوای/٣و هێزەکانی بەرگری و فریاکەوتن لە قۆڵی کارەباکەی ڕێگای تەللووەردەوە دوژمنیان تێکشکاند.

بەداخەوە لەوێ فەرماندەی ئازاو بە توانا عەقید نەریمان دۆشکە شەهید بوو. لە هەردوو قۆڵەکە تەپڵی سەرکەوتن لێدرا. زۆرێك لە پیاوی ئازای پۆلیس و خۆبەخشەکان لەو شەڕەدا بەشدار بوون. پۆلای تەکیەو نەجمەدین دوحێلەو وەستا سابیرو چەندانی ترم لەوێ بینی، لەگەڵ پۆلای شێخ جەنگی و شێخ جەلال. بەرەو پردی مەکتەب خالید ڕۆیشتن، بە داخەوە کۆمەڵێ پێشمەرگەو پۆلیس لە سنووری فەوجی یەکی لیوای/ ١ لەو بەری پردی مەکتەب خالید مابوون. بە دیلی کەوتنە دەستی دوژمن کە ئەمە کارەساتێکی زۆر ناخۆش بوو. هەر لەوێوە لەگەڵ هێزەکەی دژە تیرۆر بەرێ کەوتین بەرەو هێڵی شەمەندەفەرەکە. تا ئێمە گەیشتین، هێزەکانی پشتیوانی دوو بە فەرماندەیی عەمید ڕەفیق چاوشین و هێزەکانی فەوجی سێ و چوار هێڵی شەمەندەفەرەکەیان کۆنترۆڵ کردبوو.

لەگەڵ ئەوەی بەهۆی بارانێکی زۆرەوە هەندێ پێشرەوییەکانمان دواکەوت، بەڵام بە پێی نەخشەیەك لە قۆڵی ڕەشادەوە بە فەرماندەیی عەمید هیوا ڕەش و هێزەکانی لیوای/ ١٣٤و فەوجی عەلی چیمەنی لە لیوای/٣و فەوجی یەك لە لیوای/١ بەرەو نەهرەوان بێن، بەداخەوە لەو پەلامارەدا عەقید شێرزاد زەنگەنە کە پیاوێکی زۆر ئازاو دڵسۆز بوو لە نێوان پردی ڕەشادو نەهرەوان شەهید بوو، لە بەر ئازایەتی خۆی پەلەی کردبوو لە هێرشەکە، گەرچی من پەیوەندیم بە جێگری فەوجی یەك موقەدەم سەلامەوە کرد ووتم: پەلە مەکەن فڕۆکەکانی هاوپەیمانان لە نەهرەوان دەدەن. بەڵام عەقید شێرزاد هەر پەلەی کردبوو بە داخەوە گیانی سپارد.

لە کاتژمێر (١٤:٠٠) فڕۆکەکانی هاوپەیمانان لە نەهرەوانیاندا. هێزەکەی دژە تیرۆرو بەشێ لە هێزەکانی فەوجی چواری لیوای/١ هەموومان بە یەکەوە بەرەو نەهرەوان کەوتینە ڕێ کۆنترۆڵ کرایەوە. پێشمەرگەیەکی کاك شێرکۆ بە زیندوویی لەوێ خۆی شاردبۆوە نەیهێشتبوو دوژمن بیبینێ بە سەلامەتی هاتەوە.

لەو کاتەدا هەڤاڵ ئاسۆ مامەندو کاك بورهانی سەعید سۆفی و کاکە مەد حاجی کاکە ڕەش و ڕەمەزان دێکۆنی، لەگەڵ هێزەکەی لیوای/٣و هێزەکانی تر لە لیوای/٦ توانیان هەموو بەرزاییەکانی تەللوەرد کۆنترۆڵ بکەنەوە. سەرکەوتنەکان لە هەموو لایەکەوە دەستی پێکرد. لە سنووری میحوەری/٤ هەموو ئەو جێگایانەی لە دەستمان دابوو کۆنترۆڵکرانەوەو لە دوژمن پاککرانەوە.

من گەرامەوە بۆ بارەگای سەرەکی کاك شێخ جەعفەر، هەڤاڵان کۆسرەت ڕەسوڵ و شێخ جەعفەرو هەڤاڵ ڕەفعەت عەبدوڵام بینی، دەست خۆشیان لێکردم. هەڤاڵ دکتۆر کەمال کەرکوکیش هاتبوو نەخشەی ڕزگار کردنی سنووری میحوەری/٥ی بەم بەرێزانە سپارد.

لە ڕۆژی (٣١ی کانوونی یەکەمی ساڵی٢٠١٥) لە سنووری میحوەری/٥ تەنها تەللوەرد ڕزگار کرایەوە هێزەکانی لیوای/١ی سکرتاریەت کە چووبوون بۆ پشتیوانی لیوای/١١ نزیکەی ١٢ پێشمەرگەیان لەناو گوندی عەسەلییە لە قۆڵی مەلا عەبدوڵا لە خانوویەکدا مابوون. لە ڕاستیدا من هەر ئەوەندەم زانی کە باسی نەخشەکە بەم شێوەیە بوو کە دەبوو لە ڕۆژی (١ی شوباتی ساڵی٢٠١٤) بۆ ڕزگار کردنەوەی میحوەری/٥ هەڤاڵ بورهان سەعید سۆفی و هەڤاڵ کاکەمەد حاجی کاکەڕەش و ڕەمەزان دێکۆنی و لیوا عومەر لەسەر سەنگەری تەللوەردەوە بەرەو بیوتەر لە پێشرەوی دابوون ئەو قۆڵە بە هێزەکانی بەرگری و فریاکەوتن سپێردرا. لە قۆڵی عەسەلیە بۆ ئیدریس خەباز هەڤاڵ مەحموود سەنگاوی سەرپەرشتی دەکرد، لە قۆڵی خەبازەوە هێزەکانی فریاکەوتن و دژە تیرۆرو لیوای/٥ی لێبوو.

لە قۆڵی دوورەوە لیوای مام سیامەندو لیوای/٢ ئەنوەری

حاجی عوسمان بوون. هێزی تر هەبوون بەڵام من ئاگاداری وردەکاری ئەو قۆڵە نەبووم. داوای لێبوردن دەکەم لە وردەکاری ئەو قۆڵە ئاگادار نیمو ئەگەر کەسانێکم لە یاد چووبێت. شەو گەڕامەوە بارەگای میحوەر زۆر ماندوو بووم خەوتم. بەیانی (١ی شوباتی ساڵی٢٠١٥) هەڤاڵان کاك کۆسرەتو شێخ جەعفەرو کاك رەفعەتو رزگار عەلیو عەدنان حەمەی مینەو دکتۆر نەجمەدینو مامۆستا بەکرو پاشان دکتۆر بەرهەمو چەندین کادری تر هاتن بۆ بارەگای میحوەر لای ئێمە بوونو سەرپەرشتی شەڕەکەیان دەکرد، هەڤاڵ دکتۆر کەمال کەرکوکیش هاتە لامان. نیوەڕۆکەی لەسەر نانخواردن بووین. هەواڵی شەهید بوونی فەرماندە لیوا حوسێن مەنسورمان پێگەیشت. هەواڵێکی جەرگبڕ بوو بۆ هەمووومان، زۆرمان خەمخواردو هەمووان دەستمان لە نانخواردن هەڵگرت. کارەساتێکی زۆر گەورە بوو.

لیوا حوسێن مەنسوور پیاوێکی زۆر ئازا بوو، فەرماندەیەکی لێوەشاوە بوو، لە (١٠) فەرماندە بە تواناکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو. لە سەرەتای لاوییەوە لە ریزی کوردایەتی دانەبراو هەمیشە بۆ نیشتمانەکەی دڵسۆز بوو، فەرماندەی هێزەکانی پشتیوانی دوو بوو. لەناو هێزەکانی پشتیوانی دوو لەلایەن فەرماندەو پێشمەرگەکانەوە زۆر خۆشەویست بوو، پیاوێکی سادەو رووخۆشو دەم بە پێکەنین بوو، لە کارەکانیدا وردو ژیر بوو بەردەوام لە خەمی پێشخستنی هێزەکەیدا بوو، لە هەموو شەڕەکان لەگەڵ دەستەی هێرش بەربوو.

بۆ ئێوارەکەی ئەو رۆژە تەپڵی سەرکەوتن لێدرا دوژمن لە هەموو لایەکەوە شکا، لەو شەڕەدا شەهیدی زۆرماندا، بەڵام سەرکەوتنەکە لەوەدا بوو دوژمن بە قەبارەیەکی زۆرەوە تێکشکاو نەیانتوانی لە یەك بست خاکی کەرکوك بمێننەوە. بەپێی سەرچاوەکانو بەدانپیانانی دوژمن خۆیشیان زۆرترین هێزیان هێنابوو بۆ ئەو شەڕە، بە نیازی گرتنی کەرکوك هاتبوون. هەندێ سەرچاوە دەیانگوت زیاتر لە ٨٠٠ کەس لە دوژمن کوژراوە.

هەموو شیکارە سەربازییەکان بە ئەمریکییەکانیشەوە پشتڕاستی ئەو کوشتارەی دوژمنیان دەکردەوە. (٢٣٦) تەرمی دوژمن لە بەردەستی پێشمەرگە بوونو ئەوەی دوو پاتدەکردەوە کە داعش نە بۆ گرتنی موسڵو نەبۆ تکریتو رومادی نە کۆبانی هێزی وا زۆری بەکار نەهێنابوو.

لەم شەڕەدا زۆرێك لەو فەرماندانەی شکابوون لە پاشان ئالوگۆڕیان پێکرا لێپرسینەوە لەگەڵ هەندێ لە فەرماندەی لیواو فەرماندەی فەوجەکانیش کرا.

*** هەوڵی تەقاندنەوەی بیرە نەوتەکانی خەبازە:-**

داعش لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە بیرە نەوتەکانی خەبازە بتەقێننەوە، بەڵام توانرا بەسەرپەرشتی دەستەکانی سێ کۆمەڵەی زەحمەتکێشانەوە سێ تیرۆرست بکوژن لەناو کۆمپانیای نەوتی خەبازەو رێگری لە تەقینەوەکە بکەن.

*** هێرش بۆ سەر (تەللوەرد)و (مورە):-**

بڕیاردا لە کاتژمێری (٧:٠٠) لە رۆژی (٩)ی ئاداری ساڵی (٢٠١٥)، بە فەرماندەیی (شێخ جەعفەر) لە هێزەکانی حەفتا لە دوو قۆڵەوە، لە قۆڵی چەپی تەللوەرد لە هێڵی شەمەندەفەرەوە تا گوندی (مورە)و (سوڵتان مەرعی) و دووریانی گوندی (تەللوەرد)، لیوا (رەسوڵ عومەر) فەرماندەی میحوەری چوار سەرپەرشتی بکات، ئەم هێزانە بەم شێوەیە بەشداری تێدا بکەن:-

١- لیوای سێ تایبەت بۆ هێڵی شەمەندەفەرو ناو جەمەلۆنەکانی کۆمپانیایی خالید تا گوندی (مورەی بچووك) بۆ گوندی (سوڵتان مەرعی).

٢- هێزەکانی میحوەری یەك دەبێت.

٣- لیوای یەك جێگەی ئەو هێزانە بگرنەوە لەدوای کۆنترۆڵکردنەوەی.

٤- هێزەکانی دژە تیرۆر بۆ پردی فەتحەو موسڵ، لەوێوە بۆ دووریانی گوندی تەللوەرد کە بازگەی داعش بووە.

٥- هێزەکانی هەردوو لیواکانی پاسەوانی سنوورو لیوای شارەزوور بە فەرماندەیی لیوا (کاکە مەد حاجی کاکە رەش) بۆ گوندی (دوور کارەبا)و جەمەلۆنەکان تا (کەواز کورد)، تا لەگەڵ هێزەکانی میحوەری پێنج یەکبگرنەوە.

لەسەر بەرزاییەکانی (تەللوەرد)، تیمێکی فەرەنسی لێبوو بە دووربینەکەیان سەیری ناو گوندی سوڵتان مەرعیمان دەکرد، جوولەی زۆری داعشی تیابوو، بۆیە فرۆکەکانی فەرەنسا بە چڕی ناو گوندی سوڵتان مەرعیان بۆردوومان کردو هەرچی تیا بوو کوشتیان، لە کاتی خۆیدا فرۆکەکانی هاوپەیمانانیش بۆردوومانی مۆڵگەکانی دوژمنیان کرد.

بەرگری لەناو گوندی سوڵتان مەرعی هەبوو، بە زوویی تێکشکان. کە پێشمەرگە پردەکەیان کۆنترۆڵ کرد، هێزەکەی دژە تیرۆر بەرەو دووریانەکەی تەللوەرد بەرێکەوت، هێزەکانی لیوای سێ بە فەرەماندەیی عەمید ئەیوب جێگەکانی خۆیان کۆنترۆڵ کرد. فەرمادەی فەوجەکانیان ئازایانە گەیشتنە شوێنی مەبەستو لەوێ هێزەکانیان دامەزراند، هێزێکی خۆبەخش هاتنە دووریانەکەی بەردەوام گوندی (تەللوەرد)، پێکهاتبوو لە عەمید (پیرۆت)، عەقید (پۆڵا)، عەقید (رزگار محەمەد ئەمین)، نەهرۆ نەجم کەرکوکیو حەمەسوور.

هێزەکانی فریاکەوتن لیوای یەکەی پاسەوانی سلێمانیو بە فەرماندەیی لیوا (عومەر)، لیوای دووی بەرگریو فریاکەوتن بە فەرماندەیی لیوای رەمەزان دێکۆنی)، گوندی (دوور کارەبا)و جەمەلۆنەکانیان کۆنترۆڵ کرد، لە قۆڵی (بیوتەر) و (مەلا عەبدوڵڵا)وە هێزەکانی پشتیوانی دوو کە پاڵپشتی هەردوو قۆڵەکەی دەکرد، لە هەمانکاتدا وەکو هێزەکانی تر لە هێرشدا بوون لەگەڵ عەمید (روکن مەریوان).

هێزەکانی لیوای یانزە بەفەرماندەیی لیوا (نەهرۆ ئەسوەد)و لیوای کۆیە بە فەرماندەیی لیوا (مام سیامەند حەمە رەزا)، گوندی (بیوتەر)و ناو مەرکەزی ناحیەی (مەلا عەبدوڵڵا) یان کۆنترۆڵ کرد.

هێزەکانی میحوەری پێنج جێگاکانی خۆیان کۆنترۆڵکرد، لیوای سێی تایبەتو هێزەکانی میحوەری چوار بەرەو ناو

بارەگای کۆنی لیوای چلوحەوت بەرێکەوتن، پێشمەرگە هەوڵی دا گوندی (تەللوەرد) کۆنترۆڵ بکات، بەرگری زۆری تیابوو، لە راستیدا ئەو جێگەیە لە بەرنامە دا نەبوو، بەپێی نەخشەکە (١٠٠٪) جێگەکانی خۆیان کۆنترۆڵ کرد بێ هیچ زیانێك تەنها دوو برینداریان هەبوو.

* هێرشی کردن بۆ سەر دووژمن:-

لە رۆژی (١٢)ی ئاداری ساڵی (٢٠١٥) لە سەعات (٦:٠٠) هێزەکانی پێشمەرگە هێرشیان کرد بۆ گوندی (قەریاڵ)، گوندی (مەریەم بەگ)، گوندی (سوور)، گوندی (نەوافل)، کە هێرشەکان ئەم هێزانە دەستیان پێکرد:-

١- لیوای دووی تایبەت.
٢- لیوای سەدو شەش.
٣- لیوای سێ تایبەت.
٤- هێزێکی گەریلا.
٥- هێزەکانی میحوەر.
٦- لیوای سەدو بیست و هەشتی دووکان.

لیوای دووی تایبەت بە فەرماندەیی عەمید (تەها رەشید)
- هێرشیان بۆ خانووەکەی شێخ فەنەروو شێخ هەزاع دەستپێکرد، سەرەتا دووژمن بەرگری زۆری کرد پاشان شکان.
- لیوای سەدو شەش بە فەرماندەیی عەقید (محەمەد تەپەدێی) بۆ قەریاڵ پێشرەوییان کرد.
- لیوای سێ تایبەت بەفەرماندەیی عەمید (زانیار)و عەمید (مامە) بۆ نێوان قەریاڵو کانوونی شێخ فەنەر رۆیشتن، رێگاکەیان هەمووی بۆمبرێژکراوە، تیمەکانی ئەندازەی سەربازیو هێزەکانی پشتیوانی دوو زۆر بە وردی لە پێشەوە هێزەکە کاری خۆیان کرد.
- لیوای سەدو بیست و هەشت بە فەرماندەیی لیوا عوسمان شارستێنی بەپێ لە پردە رووخاوەکەی قەرەیالەوە پەڕیبوونەوە لە پرۆژەکەی ئاوەکە دەستیان بەسەر هەمەرێك و چەند پارچە چەکێکدا گرتبوو.
- لیوای سەدو چواردە بە فەرماندەیی عەمید سەرکەوت چیمەنی بەرەو رێگای رەشاد تا گوندی حومێرە رۆیشتن.
- لیوای سەدو سی و چوار بە فەرماندەیی عەمید شێرزادو بیلال بەرەو گوندی نەوافل و وەستانییەو کۆمەڵگای سەدام رۆیشتبوون لەوێ تووشی شەڕی گەورە بوون، هێزە تایبەتەکەی شێخ جەعفەر بەدەنگیانەوە چووبوون.
- هێزەکانی لیوای یەك بەشێك لە هێزەکانی پشتیوانی دوو بەرەو ناو گوندەکانی مورەو یەرموك رۆیشتبوون.
- هێزەکانی لیوای دووی سکرتارییەت بە فەرماندەیی لیوا (تەها کانی بەردی) بەرەو کۆمەڵگای شەهید رۆیشتبوون.

هەموو هێزەکان لە کاتژمێری (١٥:٠٠) جێگاکانی خۆیان بێ زیان کۆنترۆڵ کردبوو.

ئێوارەکەی سەربازێکی لیوای سێی تایبەت رێگای لێ هەڵەببوو کەوتە ناو دوژمنەوە تەقەیان لێکردوو شەهید بوو، ئەو ناوچانە بەدرێژایی ٢٥ کیلۆ مەترو بە قووڵایی ٧ کیلۆ مەتر لە دوژمن پاککرانەوە.

* رزگارکردنی گوندەکانی (وەحدە، سەعد، خالید):-

لە رۆژی (١٦)ی ئاداری ساڵی (٢٠١٥) لە کاتژمێری (٦:٠٠) هێرش دەستی پێکرد بۆ سەر گوندەکانی وەحدە، سەعد، خالید کە هێزەکانی دژە تیرۆرو میحوەری داقوق و هەردوو لیوای شانزەو سەدو شانزەو هێزی مەلبەندو شێخ جەعفەر بەشدارییان تێداکرد.

شەڕەکەی گوندی (وەحدە) زۆر گەرم بوو، هێزەکان لە هەموو لایەکەوە هێرشیان کرد بۆ هەرسێ گوندەکە، گوندی (جەدیدەکان) بەسەرپەرشتی وەستا رەسوڵ هێرشیان بۆی کرد.

لیوا مەریوان و عەقید سیروان چەکە گەورەکانیان ئامادەکردو تیمی سەربازی خۆیان نارد لەگەڵ تیمێکی ئەندازەیی شارەزا لە حەشدی شەعبی تورکمان بۆ گوندی جەدیدە، حەبالی، جەیدەی عەشایەری.

هێزەکان لە پشتی تازەوە رۆیشتن و ئەرکی سەرپەرشتی شەڕەکە لەلایەن عەمید رزگار محەمەد ئەمین و شەماڵ عەباس، سەرپەرشتی دەکرا.

عەقید (خەلیلە سوور) هێزێکی باشی لەگەڵ بوو، دەبوو تیمی ئەندازە بەدرێژایی پێنج کیلۆ مەتر شەقامەکە پاك بکاتەوە، گیای بەهار زۆر بەرز بوو، کۆنترۆڵ کردنی بۆمبەکان ئاسان نەبوو، لە سەعات (١٥:٠٠) هێزەکانی پێشمەرگە گەیشتنە ناو گوندەکان، دوژمن هەڵاتبوو.

* شەڕی گوندەکانی عوزێریە، عەتشانە، گوامات، بان شاخەکان:-

بڕیار بوو کاتژمێر (٦:٠٠) هێرش بکەن، بەهۆی دواکەوتنی بۆردومانی فڕۆکەی هاوپەیمانان، هێرشەکە دواخرا بۆ کاتژمێر (٨:٠٠).

لە کاتژمێر (٧٠٠) لیوا (شەمسەدین)و عەمید رۆکن (رێبوار)و تیمەکانی ئەندازەو تانك و زرێپۆش وورده ووردە رێگاکەیان کۆنترۆڵ کرد، هێرش دەستی پێکرد.

لە قۆڵی راستەوە کە لە نێوان پێشمەرگەو حەشدی شەعبی تورکمانی بوو، بە عەمید (سەرحەد قادر) سپێردرا، ئەوانیش بەباشی هێرشی خۆیان دەست پێکرد بۆ سەر (تەل ئەحمەد)، کە دەکەوتە رۆژهەڵاتی بەشیرەوە، بە هۆی چاڵ و چۆڵی و حەوزی ماسییەوە ئاسان نەبوو رێگاکان بکرێتەوە، رۆڵی شۆفێری شۆفڵەکان زۆر ئازایانە نەبوون، لە پێشەوەی هێزەکە دەرۆیشتن بەڵام هێزەکان بە سەلامەتی گەیشتنە ناو گوندی (عوزێرییە).

* شەڕی گوندی (مورە):-

لە رۆژی (٦ی تەمووزی ساڵی٢٠١٥) من مۆڵەت بووم لە سلێمانی. (٧ ی تەمووزی ساڵی٢٠١٥) شەوەکەی تەلەفۆنێکم لە مامۆستا کاوە بۆ هات کە داعش پەلاماری سەنگەرەکانی پێشمەرگەی داوە لە سنووری کۆمەڵگای شەهیدو حومێرەو مورە لە (١٣:٢٠) هێرشەکەیان دەستی پێکرد.

بە تەلەفۆن کاك شێخ جەعفەرم لە کەرکوك ئاگادار کرد، ئەویش بە هێزەکەیەوە رۆیشت بەرەو شەڕەکە من خۆم

گۆڕێو گەڕامەوە بۆ کەرکوك، کاتژمێر (٠٠:٢) گەیشتمە کەرکوك، لە ڕێگابووم کاك هیوا ڕەش فەرماندەی لیوای/١ پەیوەندی پێوەکردم کە گوندی مورە لە لایەن دوژمنەوە گیراوە کە هەر دوو فەوجی (١و٤)ی لیوای/٢ی لێبوو لیوا هیوا بە هێزێکەوە چووبووە ناو مورەی بچووك و هێڵی بەرگری دروست کردبوو.

من گەیشتمە هێڵ هەڤالان شێخ جەعفەرو لیوا ڕوکن مەریوان بە هێزێکی زۆرەوە لەوێ بوون لەسەر ئاوەکە کۆبوونەوەیەکمان کرد، چاوەڕێی هێزەکەی لیوای/٣مان دەکرد، عەمید ئەیوبو هێزەکەیان گەیشتن، هێزە تایبەتەکەی مەڵبەند هاتن، لە سەعات (٠٠:٤) هەمووەمان بەرەو گوندی مورەی بچووك بەرێکەوتین، هێزە تایبەتەکەی کاك شێخ جەعفەر بەرەو گوندی شەهید بەرێکەوتبوون، فریای شەرەکەی ئەوێ کەوتبوون، لیوای/١٤٤ بە فەرماندەیی عەمید سەرکەوت چیمەنی لەوێ بوون کە هەرسێ فەوجی (١ - ٢ - ٣) لە گوندەکە بوون شەرێکی زۆر قارەمانانەیان کردبوو. داعش کوژراوی زۆری هەبوو، دوژمنیان بە باشی شکاندبوو تەرمی چەندین تیرۆرست لە بەردەمی فەوجەکەی یاسین دەربەندی کەوتبوو، لە ڕێگا لەگەڵ عەقید محەمەد تەپەدێی پەیوەندیم کرد، ئەویش زۆر بەورەوە ووتی:- من هێزم پێویست نییە، بەڵکو دەبێت (٢٤) سەعات شەر بکەم ئەوسا داوای هێز بکەم. بەرگرییەکی قارەمانانەیان کردبوو، لەگەڵ لیوا تەها فەرماندەی لیوای/٢ی سکرتارییەت قسەم کرد لەسەر ڕێگای ڕەشاد، ئەویش ووتی:- وەزعمان زۆر باشەو هیچمان پێویست نییە، لەگەڵ لیوا شێرزاد بیلال فەرماندەی لیوای/١٣٤ قسەم کرد لە هەردوو گوندی نەوافلو یەرمووك، ئەویش ووتی: دوژمنمان شکاندووەو هیچمان پێویست نییە. لەناو گوندی مورەی بچووك بە فەرماندەیی شێخ جەعفەرو لیوا ڕەسوڵ عومەر فەرماندەی میحوەری/٤ فەرماندەی لیوای/١ لیوا هیوا ڕەشو فەرماندەی لیوای/٣ی تایبەت عەمید ئەیوبو لیوا ڕوکن مەریوان فەرماندەی هێزەکانی پشتیوانی /٢و عاسی مۆردخواردەییو ڕائید قادر فەرماندەی هێزە تایبەتەکەی مەڵبەندو عەمید تالیبو عەمید پیرۆت نەخشەی گرتنەوەی گوندی مورەمان دارشت، من پێشنیارم کرد کاتژمێر (٠٠:٦) دەست بە هێرش بکەین. لە کۆبوونەوەکە بووین داعش هێرشی کردە سەرمان لەناو گوندی مورەی بچووك. هێزەکان بە توندی وەڵامیان دانەوە. عەمید ڕوکن خالید لەگەڵ تیمی ئەمریکییەکان بە سەرپەرشتی نەقیب مارکۆس، لەسەر هێڵە کۆنەکە بوون پەیوەندییان پێوەکردم کە بەرنامەتان هەیە بۆ ڕزگارکردنی گوندی مورە. ووتم: بەڵێ کاتژمێر (٠٠:٦) هێرش دەکەین ئەوان بە فڕۆکە لە گوندەکەیان دا شەر بەردەوام بوو تا کاتژمێر (٠٠:٦) بەم شێوەیە نەخشەی ڕزگارکردنی گوندەکەمان دانا. لە قۆڵی ڕاستەوە هێزەکانی پشتیوانی/٢و لیوای /٣ی تایبەتو هێزە تایبەتەکەی مەڵبەندو هێزەکانی لای من. من سەرپەرشتی بکەم. لە قۆڵی چەپەوە هێزەکانی لیوای/١و هێزێکی یەکەکەو پاشان هێزەکانی دژە تیرۆر بە فەرماندەیی پۆلا شێخ جەنگی هاتنە لای قۆڵی چەپو هێزەکان جوولەیان کرد.

من لەگەڵ عەمید ئەیوب بە ئۆتۆمبیلێکی گوللە نەبڕ لەگەڵ هێزەکان جوڵەمان کرد. لە ماوەی (٢٥) دەقیقە هێزەکانی پشتیوانی/٢و لیوای/٣ی تایبەتو هێزەکانی مەڵبەندی/٢ گەیشتنە پشتی گوندەکەو فڕۆکەکان هەر لە بۆردومانکردنی گوندەکە نەوەستا بوون.

پەیوەندیم بە عەمید خالیدەوە کرد کە بۆردومان ڕابگرن، هێزەکانی دژە تیرۆر لیوای/١ چوونە ناو گوندەکە، ئێمەش لە سەرووی گوندەکەوە چووینە ناو گوندەکەوە. دوژمن شکاو کوشتاری زۆری داو بە دەیان تەرمی داعش کەوتنە ژێر دەستی پێشمەرگە، سەرکەوتنێکی بێ وێنە تۆمار کرا. بەداخەوە لەو شەوەدا (٦) شەهیدمان دا. کە لە هێرشەکەی شەوی پێشوو شەهید بوونو یەك پێشمەرگەش بە برینداری کەوتە دەستی دوژمن.

هەر ئەو ڕۆژە کە هەینی بوو ئۆباما سەرۆکی ئەمریکا لە ووتاری هەفتانەی خۆیدا باسی لە قارەمانی هێزی پێشمەرگە کرد لە باشووری کەرکوك. ئەبوبەکر بەغدادیش لە بەیاننامەیەکدا شکستی خۆی لەو شەرە ڕاگەیاند. بەپێی بۆچوونی نووسەرێکی ئیسلامییەکان دەڵێ:- (١٦٠٠) کەس لە داعش لەو شەرەدا بەشدارییان کردو نەیانتوانی سەرکەوتن بە دەست بێنن.

* (ڕزگارکردنی گوندەکانی ئەلبونەجم و ١١ گوند)

لە (٢٢ی ئابی ساڵی٢٠١٥) پاش ئامادەکردنی نەخشەکە جارێکی تر دانیشتن لە ڕێگای داتاشۆوە نەخشەکە پێشکەش کراو هەموو ڕای خۆمان لە سەری دا، کاکەڕەشو ڕەمەزان دیکۆنیو لیوا عومەر ڕای جیاوازیان هەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی نەخشەکە لەلایەن ئەو تیمانەوە دیاری کرابوو بڕیاردرا وەکو خۆی جێبەجێ بکرێت. هێزەکان بەم شێوەیە دابەشکران:-

١- هێزەکانی پشتیوانی دوو، هێزەکانی دژە تیرۆر بۆ ناو گوندەکانی ئەلبونەجمو تەلبەسەل.

٢- هێزەکانی بەرگریو فریاکەوتن بۆ گوندەکانی سماقەی خواروو سماقەی ژووروو و دەکشانو ئەلبوشەهاب چەند گوندێکی تر لە سنوورەکە بە پاڵپشتی هێزەکانی پشتیوانی دوو.

٣- هێزەکانی لیوای/٣ی تایبەت بۆ گوندەکانی دبچو خاشانە.

٤- هێزەکانی لیوای/١٦و لیوای/٦ بۆ گوندەکانی زەرگەو ئەبو زەرگە، فەرماندەکان ناردران بۆ سنوورەکەو هەر کەسە بەدواداچوونی خۆی کرد.

هەموو پێداویستی شەرەکە لە بواری لۆجیکییەوە بە مامۆستا کاوە لێپرسراوی ئیدارەی میحوەر سپێردرا، ئەوەش تەنها لەبەر لێهاتوویی مامۆستا کاوە بوو لە کاروباری ئیداریدا. ئەگەرچی ئەو گوندانە لە سنووری میحوەری/٣ بوو.

هێزەکانی بەشداربوو زۆربەیان بەرگریو فریاکەوتنو میحوەری/٣ بوون، هێزەکانی لیوای/٣و دژە تیرۆر لەگەڵ هێزە تایبەتەکەی مەڵبەند لەسەر میحوەری/٤ ئەژمار دەکران. لەبەر ئەو هۆکارە لەلایەن هەڤاڵ شێخ جەعفەرو

ئاسۆ مامەندەوە داوام لێکرا بەهێزێکی یەدەکەوە بچمە بەرەی شەڕەکە.

*** دەسپێکی ئۆپراسیۆنەکە**

لە کاتژمێر (٣:٠٠) چووم بۆ مەڵبەندی کەرکوك لەگەڵ هەڤاڵ ئاسۆ مامەند بەرەو ناوچەی ئەلبونەجم بەرێکەوتین. گوندی ئەلبونەجم دەکەوێتە سەر رووباری رۆخانە هاو سنوورە لەگەڵ گوندەکانی عەشرەتی داودە. دەبوو هێزەکانمان لە دوو میحوەرەوە هێرش بکەن. لە میحوەری ئەلبونەجم گوندەکە کۆنترۆل بکرێت پاشان بۆ ٩ گوندەکەی تر بڕۆین. من سەرەتا وەکو هێزێکی یەدەك دانرام. هەڤاڵ شێخ جەعفەرو هەڤاڵ ئاسۆ مامەند لە مەیدانی شەڕەکە بوون. هەڤاڵ لاهور شێخ جەنگی بەرپرسی گشتی هێزەکانی دژە تیرۆرو کاك شێخ جەلال بەرپرسی هەواڵگری پێکەوە چووینە پێشەوە بۆ سەر سەنگەرەکان. من بێ تەلم پێبوو. لەگەڵ لیوا روکن مەریوان قسەم پێکرد، کە سەرپەرشتی هێزەکانی پشتیوانی دووی دەکرد. لە هەمان کاتدا لە قوڵی راستی ئاوایی فەریقەوە جوولەی دەکرد بۆ ئاوایی ئەلبونەجم. هێزەکانی دژە تیرۆریش دەستیان کرد بە جوولە، بەهۆی بۆمبی چێنراوەوە هێزەکان لەسەر خۆ دەڕۆیشتنە پێشەوە. بەو هۆیەوە شەهیدو بریندار لە هێزەکانی پشتیوانی دوو هەبوو. هەموو فەرماندە مەیدانییەکان بەردەوام لەگەڵ من لەسەر خەت بوون، تاکو توانرا بچینە ناو گوندەکەوە لەنێوان هەردوو گوندی ئەلبونەجم و تەلبەسەڵ شەڕی قورس دروست بوو، هێزەکانی دژە تیرۆر برینداریان هەبوو. لەگەڵ گرتنی گوندی تەلبەسەڵ هەڤاڵ شێخ جەعفەرو هەڤاڵ ئاسۆ مامەندو بەندە پێکەوە بە هێزێکی زۆرەوە چووینە ناو گوندەکەوە. لەو کاتەدا هەڤاڵ کۆسرەت و محەمەدی حاجی مەحموودو مستەفای سەید قادر وەزیری پێشمەرگەو مستەفا چاورەش و چەندین سەرکردەو فەرماندەی تر هاتبوون. لەگەڵ هێزەکانی فریاکەوتن بەرەو گوندی سماقەکان بەرێ کەوتین، لە گوندی سماقەی گەورە هێزی دوژمن ویستیان دژە هێرش بکەن، هێزە تایبەتەکەی من و هەڤاڵ ئاسۆ بەرەنگاریان بوونەوە.

لەگەڵ لیوا کاکەمەدو لیوا رەمەزان دیکۆنی لیوا سەعید عەلی لە ئۆتۆمبێلەکەی شێخ سەعید سەرکەوتین بەرەو ناو گوندی سماقەی خواروو. بەرێ کەوتین گەیشتینە قەراغ گوندەکە دابەش بووین تا هێزەکە گەیشتە لامان، لەو کاتەدا عەمید روکن لوقمان بەزریپۆشێکەوە گەیشتە لامان و ناردیانم بۆ تەپە یەك لەو بەری گوندەکەوە. من گەرامەوە بۆ تەلبەسەڵ هەڤالان کاك کۆسرەت و کاك شێخ جەعفەرو برادەرانم بینی. پاشان ئەوان گەرانەوە من لەوێ مامەوە تا هێزەکانی لیوای/٣ی تایبەتی هەڤاڵ کۆسرەتم بەرێکرد بۆ دیبج و خۆشم لەگەڵیان چووم، ئەو گوندەش کۆنترۆل کرا لە قوڵی زەرگەو ئەبو زەرگەشەوە هەڤالان عەبدوڵا بۆرو لیواکانی/ ١٦و ١١٦ ولیوای/٦ ئامانجەکانی خۆیان کۆنترۆل کرد، پاشان گەرامەوە سماقەی خواروو لەگەڵ هەڤالان کاکەمەدو رەمەزان دیکۆنی سەنگەرەکانمان دابەش کردەوە. لەگەڵ شێخ جەلال دانیشتین فەوجێکمان لە لیوای/١١٤ لە گوندی ئەلبونەجم هێشتەوە. ئێوارەکەی گەرامەوە میحوەر. شەو لە کەرکوك TV راگەیاندنی کۆتایی سەرکەوتنەکانمان باسکرد کە ١١ گوندمان لە دەستی داعش رزگار کرد.

*** شەڕی حومێرە**

شەوی ٧ لە سەر ٨ی تشرینی یەکەمی ساڵی٢٠١٥ دوژمن پەلاماری سەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگەی دا لە گوندی حومێرە فەرماندەو پێشمەرگە قارەمانەکانی لیوای/١٠٦ مەردانە لێیان هاتنە دەست و توانیان دەیان کەسیان لێ بکوژن و هێرشەکە تێکبشکێنن.

لیوای ١٠٦ بە فەرماندەیی محەمەد تەپەدێی ماوەی حەوت مانگە لە ناو گوندی حومێرەیە کە (٢) کیلۆ مەتر لە پێشەوەی سەنگەرەکانی پێشمەرگەوەن، بەو پەڕی دڵسۆزییەوە سەنگەرەکانی خۆیان پاراستووە لە هێرشی دوژمن.

*** شەڕی رزگارکردنی گوندی (بەشیر):-**

رۆژی (٣٠)ی نیسانی ساڵی (٢٠١٦)، دواین ساتەکانی داعش بوو لە (بەشیر) ئەو گوندە تورکمانییەی لە مانگی حوزەیرانی ساڵی (٢٠١٤)ەوە لە دوایی شەڕێکی چەند کاژێری داعش لەگەڵ سوپای عێراقدا دەستیان بەسەرداگرت، لەو کاتەوە وەکو شوێنێکی ستراتیژی بەکاری دەهێنا بۆ هێرشکردنە سەر شارۆچکەی (خورماتوو) و (کەرکوك).

لە کۆتاییدا پێشمەرگە بە خوێنی (٣) شەهیدو (١٧) بریندار رزگاری کرد. کە ئەم ناوچەیە گرنگی خۆی هەبوو بۆ کوردو پێشمەرگە:-

١- ناوچەیەکی ستراتیژی سەربازییە.

٢- پێشمەرگە بەچاوی هاووڵاتییەوە سەیری هەموو پێکهاتەکانی کەرکوك دەکات و بەهی خۆیانی دەزانێت.

٣- پرسێکی مرۆڤایەتییە کە (١٧٠٠) خێزانی تورکمانی دەربەدەرن و رزگارکردنی دەبێتە هۆی گەڕانەوەی ئەوانە بۆ سەر ماڵ و حاڵی خۆیان.

رزگارکردنی گوندی (بەشیر) بە رووداوێکی ستراتیژییانەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان دادەنرێت بۆ داهاتووی پێشمەرگەو هەرێمی کوردستان، کە پێشمەرگە توانی بۆ ماوەیەکی کەم ئەم سەرکەوتنە تۆمار بکات، ئەم داستانە گەورەیە بووە وەرچەرخانێکی گەورە لە شەڕی داعشدا، چونکە رزگار کردنی (بەشیر) خاڵێکی گرنگە لە ناوچەکە بۆ رزگارکردنی (حەویجە) و (ریاز).

***سەرچاوەکان:**

١- داعش و داعشناسی، کۆمەڵێك نووسەر، دەزگای ئایدیا، سلێمانی، چاپخانەی دلێر، ٢٠١٥، لاپەرە(١٦٠).

٢- کوردستان و پۆست - داعش، کۆمەڵێك نووسەر، ناوەندی لێکۆڵینەوەی رووداو، هەولێر، ٢٠١٦، لاپەرە (٧٢).

٣- یادداشتەکانی وەستا رەسوڵ، دەستنووس.

*** ناوی بەشێك لە شەهیدانی شەڕی داعش لە کەرکوك**

نەقیب (سامی حوسێن مەولود)، نەقیب (ڕەحمان عەلی ڕەسول پیرۆت)، نەقیب (سۆران هاید مەولود حەمە، مولازم (عەلی عەبدولحسەن عەبود)، (حوسێن مەنسور کەرەم)، (عەلی فازل عەلی نادر)، (محەمەد عیرفان محەمەد)، (مەریوان ئەنوەر محەمەد)، (بەهجەت محەمەد محەمەد ئەمین)، (شاهۆ نوری محەمەد ڕەشید)، ئەرکان جهیانباش ڕۆستەم)، (هارون خەزعەل زائیر)، (مەقدید حەمید سەلیم)، (محەمەد ئەمین ئەحمەد ئەمین)، (دابان حەمە سالح حەمە خورشید)، (بڕوا ئەحمەد فەتاح)، لیوا (شێرکۆ فاتیح نامیق)، موقەدەم (عەبدوڵڵا عەجیل حەسەن)، نەقیب (قادر ئەحمەد ڕەسوڵ)، نەقیب (موعتەسەم جەمال سدیق)، نەقیب (شەماڵ کەمال ئەحمەد)، نەقیب (بەرزان فاتیح محەمەد)، مولازمی یەکەم (هاشم ئەنوەر عەزیز)، (دانا عەباس موجبان)، (دلشاد خورشید سەمین)، سەمەد ئەحمەد حوسێن، حەسیب جەبار ستار کەریم، نەشئەت جەمیل حەمە، سائیر فەیزوڵڵا عەبدوڵڵا، هەڵکەوت محەمەد قادر، کاوە محەمەد، عەلی محەمەدی عەبدوڵڵا، ئیبراهیم جەماڵ جەلال، مەریوان مەولود محەمەد، عادل عەلی حەیدەر، شاخوان ڕەشید، ئاراز ڕەفیق کەریم، شێروان قابیل، بورهان عومەر ئەمین. هیشام نەبیل خورشید، ڕۆکان محەمەد عەباس، یاسین حوسێن، ناسیح عاسی سەعید، ئومێد محەمەد مەجید، هێمن عادل غەفوور، ڕێبوار شکور حەمە لاو، محەمەد جەوهەر سەعید، ئومێد فایق کەریم، قەیسەر ئیسماعیل محەمەد نەجم، سۆران محەمەد سەعید، جێگیر جەلال قادر، پشتیوان عوسمان، مەریوان عەبدولڕەحمان حەمە سالح، بەرزان محەمەد مەهدی، ڕزگار محەمەد سالح، ئاوارە ئەحمەد شکور، عیسام مستەفا، ئەحمەد نادر، سامی غالیب تالیب، ئالان محەمەد بەشارەت، سیروان کەمال ئەحمەد، هێمن ئەحمەد تۆفیق، ئەحمەد ئەسعەد قادر، موقەدەم (دلشاد شکور سایر)، نەقیب (ئەحمەد حەسەن محەمەد)، ئەحمەد وەیس عەبدولڕەحمان، پێشبینی حوسامەدین بایز، هێمن حەوێز حەمە نەجم، ئاراس عومەر مەعروف، ئیسماعیل عەلا حەسەن، عومەر عەبدوڵڵا محەمەد، بڕیار ئەحمەد مەحموود، عەلی ئەحمەد قادر، سامان جەعفەر ئەحمەد، ئەحمەد سدیق تۆفیق، نەقیب (گۆڕان عەبدولخالق عیزەت، ئەحمەد حەمە سالح عەبدولقادر، سامان جەعفەر ئەحمەد، محەمەد جەواد ستار، ئادەم حەسەن محەمەد، شێرزاد خدر کەریم، ئیبراهیم ئیسماعیل، جێگیر قاسم ڕەسول، مەریوان خەلیل کاکل، ئاسۆ عوسمان حەسەن، محەمەد نەجمەدین عیزەدین، ڕزگار حەسەن غەزال، گۆران ڕەحیم محەمەد سالح، هێمن حەمە غەریب ئەحمەد، عەقید (نەریمان مەولود محەمەد)، نەقیب (محەمەد عەبدولڕەحمان عەزیز، نەقیب (دلشاد جەمال ئەحمەد)، پشتیوان حوسێن ئەحمەد، سەیف نەجیب حامد، ئاکار سەلاحەدین محەمەد، ژیلوان شێروان ئەحمەد، هۆشیار مەغدید ئیسماعیل، ڕێبوار سەعدی عومەر، ئەرکان محەمەد عەلی، پێشەنگ محەمەد جەبار، ئاریان نازم فازل نوری، کازم حامد محەمەد وسۆ، عومەر سەباح تاهیر، محەمەد محمود ئیسماعیل، زانا عەلی عەبدوڵڵا، عەلی فوئاد مایخان فروخ، حەیدەر ئەکرەم عەبدوڵڵا، کۆسرەت محەمەد مەحمود، ئەژین سەباح عەلی، کاکەمین یوسف مەروان، جەمیل عومەر ئەحمەد، موحسین عوسمان ئەحمەد، هۆگر عوسمان خالید، دەرباز عوسمان عەزیز، زیرەك حەسەن عەبدوڵڵا، گۆران عەباس فەریق، بورهان عەبدوڵڵا عەزیز، دەریا خەڵەف تاهیر، سەروا محەمەد مەجید، ئەحمەد عەلی محەمەد، یوسف مەعروف شەریف، حەیدەر حەمە ئەمین عەبدوڵڵا، هەژار ئەنوەر مەجید، سامان ئەحمەد عەلی ڕەمەزان، موراد ڕەحیم ئەمین، کاروان کامەران کەریم، هیوا فوئاد ڕەشید، محەمەد حوسێن محەمەد، کەیفی ئیبراهیم عەلی، پشتیوان ڕەحمان نەریمان، مەولود عەلی محەمەد، عەلی غازی ڕەئووف، ڕزگار عەبوش سایر، سەمەد ئەکبەر غەفوور، نەبیل سەلاح کەریم، بەسام مستەفا حوسامەدین، تەها لوقمان حەسەن، محەمەد سەباح کەریم، دێرین جەلیل محەمەد، سەرکەوت قادر سەعید قادر، هارون لەتیف کەریم، ئەحمەد غەفوور محەمەد نەجم، جوانرۆ کەریم محەمەد ئەمین، ڕەنگین یوسف عەزیز، ئیبراهیم حەمە سالح ئەمین، ڕزگار عوسمان کەریم ڕەزا، هیوا حەیدەر عەلی پاشا، عەبدوڵڵا حەسەن عەبدوڵڵا، ڕەسوڵ خدر مینە خدر، ئارام قادر عوسمان حەمەد، شێرزاد حەسەن کازم حەسەن، دیار بەکر شوکور کەریم، شۆڕش مەجید حەمید عەلی، ئاوات ئەحمەد محێدین، بڕیار ئازاد خدر سالح، هونەر عەلی سەید مەلا عەلی، محەمەد نورەدین محەمەد، عەقید (شێرزاد ڕەفعەت قادر)، عەقید (عەبدوڵڵا گەنجۆ حەسەن)، عەقید (یوسف وەحید ئیبراهیم)، مولازمی یەکەم (نەجات جەبار ئەحمەد قادر)، مولازم (مەریوان کەریم قادر)، مولازم (عەلی سالح فەتحوڵڵا)، مولازم (محەمەد کەریم ئەحمەد).

*** حەشدی شەعبی و بڵاوبوونەوەی لە خورماتوو:-**

دوای هاتنی داعش و گەمارۆدانی شارەدێی (ئامرلی) لە باشووری خورماتوو کە زۆرینەی دانیشتووانەکەی شیعەن، چەند سەرکردەیەکی حەشدی شەعبی هاتنە ناوچەکەو لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە لەو سنوورە ڕێککەوتن کە هێزێکی حەشدی شەعبی بهێنرێتە ناوچەکە، بەمەبەستی شکاندنی ئابڵووقەی داعش لەسەر شارۆچکەی (ئامرلی)، سەرەتا وا ڕێککەوتن کە دوای ڕزگارکردنی شارەدێی (ئامرلی) ئەوان وەکو حەشدی شەعبی پاراستنی ئەمنییەتی ناوچەکە لە ئەستۆ بگرن، بەڵام دیارە دوای چاوپۆشیکردن لێیان، چەندین فەوجی سەربازییان دروست کردو شوێنکەوتووانیان لە ناوچەکە پرچەك کرد، ئێستاش ئەو چەکدارانەیان لە سەنتەری شارۆچکەی خورماتوو بڵاوە پێکردووە.

ئێستا هەزارو پێنج سەد چەکداریان لەناو شارۆچکەی خورماتوودا بڵاوکردووەتەوە، ئەو چەکدارانە لە سنووری شارەدێی (ئامرلی) و تەنانەت لە ئێرانیش ڕاهێنانیان پێکراوە، ئێستا لەناو سەنتەری شارۆچکە کە جێگیر کراون. بەڕوون و ئاشکرایی ئێران هاوکاریی چەکدارانی حەشدی شەعبی دەکات و چەك و تەقەمەنییان بۆ دابین دەکات، لەکاتی هاتنی ئاغای (ئیقبال پوور) کە نوێنەری ئێرانە بۆ ناوچەکە، چەکدارێکی زۆری ئێرانی لەگەڵ خۆی هێنا، بەڵام بۆ مانەوەیان لە خورماتوو یاخو گەڕانەوەیان ئەوە پێویستمان بەزانیاری ڕاشکاوانەیە.

ئەگەر ئاسایش پشتگیرییەکی باش و هێزێکی تۆکمەی نەبێت چۆن بتوانێت ڕووبەڕووی ئەو کێشەو گرفتانە ببنەوە کە لەناو شارۆچکەی خورماتوو دروست دەبن، بە هێزێکی بچووکی وەکو ئاسایش لەوانەیە چارەسەر نەکرێت هێزێکی میلیشیایی لەناو شارۆچکەی خورماتوو جێگیربێت و ڕووبەڕووی ببێتەوەو بە ئاشکرا خەڵك برفێنێ و هەموو لایەنەکانیش ئەوە دەزانن، بەڵام هەر کاتێك کەسێکیان لێ دەستگیر بکرێت ئەوا دەبێتە هۆی دروستبوونی شەڕی تایفی لەنێوان حەشدی شەعبی و هێزی پێشمەرگە، یاخود لەنێوان کوردو تورکمانی شیعە.

حەشدی شەعبی هاتنە ناوچەکە، لە ڕێگەی شارۆچکەی کفرییەوە کە چل کیلۆ مەتر لە شارۆچکەی خورماتووەوە دوورە، ئەویش لە ڕێگای شارۆچکەی (کەلار)ەوە، دواتریش هاتنە شارۆچکەی خورماتوو، جێگیرکران و پاشان هاتنە ناو شارۆچکەوە ئێستا حەشدی شەعبی لە خورماتوو هەست بەوە دەکات کە کورد هێزێکی زۆری هەیە، ئەگەر بێتو پێشێلکاری بکەن ئەوا بە هێز ڕووبەڕوویان دەبنەوە، بۆیە ئێستا دۆخەکە تارادەیەك ئارامە.

هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی داعش لە ناوچەکەو، هاتنی حەشدی شەعبی بۆ دەڤەری خورماتوو، گەلێك دیاردەو دەستدرێژی و شەڕی خوێناوی لەنێو شارۆچکەکە ڕوویدا لەلایەن تورکمانە شیعەکان و حەشدی شەعبی، ئەویش بە سووتاندنی ماڵ و دووکانی گەڕەکە کوردییەکان کە بەتایبەتی ئاژاوەکە لەلایەن تورکمانەکانی نێو شارۆچکەدا ڕوویدەدا، پێشمەرگەو حەشدی شەعبی تێوەدەگلان بە کێشەکان. هەروەها (حەشدی شەعبی)یش دەستێکی باڵایان هەبوو لە دەرکردنی عەرەبی سوننە لەنێو شارۆچکەکە چ بە کوشتنی، ڕاگواستنی، سووتاندنی ماڵیان.

مانگی چواری ساڵی (٢٠١٦)، زنجیرەیەك، شەڕی خوێناوی لەنێوان پێشمەرگەو حەشدی شەعبی ڕوویدا کە گەلێك کوژراو لە هەردوولادا بوو، لە ئەنجامدا هێزێکی زۆری پێشمەرگە هاتنە ناو شارۆچکەکە بۆ پاراستنی خەڵکی کەرکوك و شارۆچکەکە.

لە (٢٧)ی نیسانی ساڵی (٢٠١٦) ڕێککەوتن ڕوویدا لەنێوان پێشمەرگەی کوردستان و حەشدی شەعبی بۆ ڕێککەوتن لەسەر ڕاگرتنی شەڕی ناوخۆ لە هەردوولا.

هەردوولا ڕێککەوتن بە ئامادەبوونی دکتۆر نەجمەدین کەریم، پارێزگاری کەرکوك و عەدنان حەمەی مینا بەرپرسی میحوەری پێشمەرگە لە خورماتوو، هادی عامری سەرپەرشتیاری گشتی هێزەکانی (حەشدی شەعبی).

ڕێککەوتنەکە بەم شێوەیە بوو:-

١- کشانەوەی هێزی پێشمەرگەو حەشدی شەعبی لەنێو شارۆچکەکەو ڕادەستکردنی باری ئەمنی شارۆچکەکە بۆ هێزی پۆلیس و ئاسایش.

٢- پێکهێنانی هێزێکی هاوبەش لە هەردوولا بۆ پاراستنی باری ئەمنی و ڕێگەگرتنی خۆپیشاندانی چەکداری لەنێو شارۆچکەکەو لێپرسینەوە لەو کەسانەی کە کێشە دەنێنەوە.

٣- هەوڵدان بۆ کۆبوونەوەی هاوبەش بەبەردەوامی بۆ ئەوەی لە هەوڵی چارەسەری کێشەکاندا بن.

٤- هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئەو دەستە دەرەکییانەی کە هەوڵی ئاژاوە دەنێنەوە لەنێو شارۆچکەی خورماتوو.


* سەرچاوە:-

- مجلة الانصات المركزي، ژمارە (٦٣٩٩)، ڕۆژی (٢٨)ی نیسانی ساڵی (٢٠١٦)، لاپەرە (٤).
- ڕۆژنامەی (باس)، ژمارە (٢٩٠).


یەکێتی سۆڤێت
تورکیا
چیای ئەرارات
ڕووباری ئاراس
دەریای قەزوین
گۆماوی وان
تەبرێز
متمە
ڕەزائیە
گۆماوی ئورمیە
شانەدەر
ئوشناویە
مەهاباد
براک
سەر پەلەک
موصل
ئێران
هەولێر
کەرکوك
عێراق
هەمەدان
بێستون و غاسی خاك
کرمانشاە
بەغداد
ئەشکەوتی کونجی
شوێنی کەرکوك
لە چاخەکانی بەردینی کۆندا
دیز فول




# سەردەمە ئاوەدانەکانی
# چاخە کۆنەکانی ناوچەی کەرکەك


Melidi
Mushku
Hasanlu
Arbela
Jarmo
Ganj Dara
Aratta
Gawdin
IRANIAN
PLATEAU
S Y R I A
M E S O P O T A M I A
AKKADIA
Nippor
Scale
Km. 0 100 200
Miles 0 50 100 150
ANSHAN
Susa
ELAM
Uruk
Lagash
SUMERIA
Ur
Persian Gu
ئیمبراتۆرییەتی گوتی لە ساڵی ٢١٠٠ پێش زاین
فراوانی ئاقاری ئیمبراتۆرییەتەکە
بنکەی سەرەکی گوتییەکان
Aratta
لەوانەیە پایتەختی گوتییەکان بوو بێت
ئەو شوێنانەی ئێستا کوردی لێ نیشتەجێیە
ئاقاری کەنداوی فارسی
لە ساڵی ٢١٠٠ ی پێش زاین




شوێنی کەرکوك
لە ئیمپراتۆریەتە کۆنەکاندا

■ مواقع ما قبل التاريخ و مواقع قديمة حتى حوالي 2900 ق.م
■ مواقع الثقافة السومرية - الأكدية ( حوالي 2900 - حوالي 1962 ق.م )
▲ مواقع العصر البابلي ( حوالي 1962 - حوالي 1600 ق.م )
▲ مواقع العصر الحوري
• مواقع الحضارة الآشورية
• مواقع العهد البابلي الجديد ( 612 - 539 ق.م )
× مواقع العهود الفارسية و اليونانية و البارثية المتأخرة
الأهوار




ئاقاری ئیمپراتۆریەتی میتانییەکان




پێگەی کەرکوك لە ئیمپراتۆریەتی پرسییەکاندا لە دەوری ساڵی ٥٠٠ پێش زایین


پێگەی کەرکوک لە ئیمپراتۆریەتی پرسییەکاندا
Black Sea
PONTUS
Kizil
ASIA MINOR
Edessa
Carrhae
Antioch
Damascus
SYRIA
Jerusalem
Red Sea
ARMENIA
Lake Sevan
Lake Van
Lake Urmia
Kura
GORDYENE
ATROPATENE
MEDIA
MESOPOTAMIA
Arbela
Hatra
Dura Europus
Euphrates
Tigris
Ctesiphon
Seleucia
Ecbatana
Rhagae (Arsacia)
BABYLONIA
MESENE (CHARACENE)
Susa
SUSIANA
ELYMAIS
ARABIA
Caspian Sea
HYRCANIA
DAHAE
Atrak
Nisa
Asaak
Hecatompylos
PARTHIA
MARGIANA
Dara
Merv
Darya
SOGDIANA
Maracanda
Syr Darya
Bactra
YÜEH-CHIH
Harīrūd
ARIA
ANAUON
Helmand
Farah
Neh
DRANGIANA
Daryācheh-ye Sīstān
SAKASTAN (SĪSTĀN)
Hāmūn-i-Māshkel
Indus
CARMANIA (KERMĀN)
Tabae (Esfahān)
Persepolis
PERSIS (FĀRS)
Persian Gulf
Arabian Sea
ئیمپراتۆریەتی پارسی
0 300 600 km




باری سیاسی سەرەتای خیلافەتی عومەر کوری خەتاب

ناقاری بلاوبوونەوەی ئیسلام لە سەردەمی پێغەمبەر تا خەلیفە ئەبو بەکر

ناقاری ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لە دوای کەوتنی بوسرا

ناقاری ئیمپراتۆریەتی ساسانی لە دوای کەوتنی حیرە

فەرمانرەوایی ئەکسومی ئەحباش




١ قوات عبد الله بن المُعْتَمّ؛ تواصل زحفها من تكريت إلى الحصنين ( الموصل و نينوى ) بقيادة : ربعي بن الأفكل العنزي، وبقي هو مع ألف من جنده في تكريت . ٢ خرج مع ابن الأفكل القبائل التي أسلمت واشتركت مع المسلمين في فتح تكريت .

٣ ربعي بن الأفكل يتقدم قواته إلى الحصنين، ويقسمها إلى فرقتين : فاقتحم المسلمون الحصنين بعد أن أذعن أهلها بالاستسلام .




فراوانی هێرشە عەرەبی و ئیسلامییەکان لە سێ سەدەی یەکەمی کۆچیدا


پێگەی کەرکوك
لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا
دەوڵەتی ئەمەوی
پێگە ئیسلامییەکان
دەوڵەتی بیزەنتی
بحر بنطس ( البحر الأسود )
بحر الروم ( البحر الأبيض المتوسط )
بحر إيجة
ب . مرمرة
آسـيا الصـغرى
الدولة البيزنطية
هضبة الأناضول
ديار بكر
أرض الأكراد
العراق
بلاد الشام
أرمينيا
إيران
جبل أرارات
بور غاس
إدرنة
القسطنطينية
بورصة
أنقرة
سينوب
طرابزون
باطوم
أرضروم
أزمير
عمورية
قيصرية
قونية
ملطية
زبطرة
الحدث
مرعش
عين زربة
أضنة
طرسوس
المصيصة
منبج
مرسين
أنطاليا
فتحية
رودس
خليج أنطاليا
بوزيازي
خليج إسكندرونة
قبرص
أنطاكية
حلب
نهر العاصي
اللاذقية
حماة
حمص
طرابلس
بيروت
صيدا
دمشق
نهر الفرات
ديار بكر
ماردين
الرها
القامشلي
الحسكة
الموصل
نهر دجلة
أربيل
كركوك
الرقة
دير الزور




ئاقاری جەزیرە

ئاقاری عێراق

ئاقاری کوردستان

ئاقاری ئازربایجان

ئاقاری شام

ئاقاری خوزستان

شوێنی کەرکوك لە یەکە
بەڕێوەبەرییەکانی
سەردەمی عەباسییەکاندا


آسـيا
الصغرى
الإمبراطورية البيزنطية
الروم
سلاجقة
مملكة الأرمن الكبرى
جورجيا
أذربيجان
بلاد الأكراد
ديار بكر
سنجار
الموصل
الدولة الأيوبية
سوريا
دمشق
عكا
بلاد الشام
الخلافة العباسية
بغداد
التمدد المغولي
التمدد المغولي
التمدد المغولي
قادمون من أواسط آسيا
إسماعيليون
إيـران
مصـر
الدولة المملوكية
القاهرة
الصعيد
العرب
جزيرة
نجـد
المدينة النبوية
الحجاز
الأشـراف
مكة
البحرين
آل عصفور العقيليون
الدولة الأيوبية
صحراء الربع الخالي ( صيهد وويار )
اليمن
حضرموت
بنو رسـول
دەوڵەتی مەمالیك
ناڤاری دەوڵەتی ئەیوبی
ناڤاری دەوڵەتی بیزەنتی
ناڤاری دەوڵەتی ئەرمینیا
سنووری داگیرکاری خاچ پەرستان لە ڕۆژهەلات
دەوڵەتی جۆرجیا
جیهانی ئیسلامی
ئیمارەتی ئیسماعیلیە
دەوڵەتی ئەسرانی

# کەرکوك لە ئاقاری دەوڵەتی سەلجوقیەکاندا




کەرکوك لە ئاقاری دەوڵەتی
ئیلیخانییەکاندا
دەریای ڕەش
دەریای سپی ناوەراست
تورکیا
لیبیا
لوبنان
میسر
ئێران
ئەفغانستان
سعودیە
سودان
پاکستان
دەریای سور
هند
کەنداوی عومان
یەمەن
دەریای عەرەبی

# کەرکوك لە ئاقاری دەوڵەتی صەفەوییەکاندا

دەریای قەزوین
دەریای ڕەش
سیواس
ئاق قوینلو
ئەرزە رۆم
تەبریز
سوڵتانیە
رەها
موسڵ
صەفەوییەکان
بەغداد
ئەصفەهان
کرمان
دەریای سپی ناوەڕاست
قودس
قاهیرە
مەمالیک
دەریای فارس
دەریای قەلزەم

FRANCE
SPAIN
PORTUGAL
MOROCCO
Algiers
ALGERIA 1519
TUNIS
AUSTRIA
Vienna
To Vienna, 1529, 1683
HUNGARY 1541
TRANSYLVANIA 1541
To Krakow, 1502, 1519
To Moscow, 1571–72
RUSSIA
Azov
To Kazan, 1521
ITALY
BOSNIA 1463
Danube R.
MONTENEGRO
BULGARIA 1393
Constantinople 1453
GREECE 1460
1543
Black Sea
ANATOLIA 1300s
GEORGIA (1646)
ARMENIA 1548
DAGESTAN
TURKESTAN
Caspian Sea
AZER-BAIJAN
KURDISTAN 1515
MESOPOTAMIA 1534
PERSIA
SAFAVID EMPIRE
Mediterranean Sea
TRIPOLI 1551
Cairo
EGYPT 1517
Libyan Desert
Sahara
Nile R.
Nubian Desert
Red Sea
Medina
Mecca
Suakin
Massawa
Arabian Peninsula
HASA 1555
Persian Gulf
1521
OMAN 1521
YEMEN 1517
10° Longitude East of Greenwich 20° 30° 40° 50°

فراوانترین سنووری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەر لە سالی ١٤٦٣

0 400 800 Kilometers
0 200 400 Miles

شوێنی کەرکوک لە نەخشەیەکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی




ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەسەردەمی سوڵتان سلێمانی گەورە ١٥٨٠ی زایینی


North Sea
Baltic Sea
Warsaw
Kiev
Europe
North Atlantic Ocean
Vienna
Budapest
Venice
Belgrade
Bucharest
Caffa
Marseille
Varna
Black Sea
Prizren
Sofia
Constantinople
Caspian Sea
Barcelona
Rome
Salonica
Baku
Athens
Tunis
Algiers
Alexandretta
Mediterranean Sea
Damascus
Baghdad
Asia
Tripoli
Alexandria
Jerusalem
Cairo
Persian Gulf
Africa
Medina
Mecca
Red Sea
Kassala
Zeila
ئیمبراتۆریەتی عوسمانی لە ساڵی ١٦٨٣
سەرەتای سوڵتانە عوسمانییەکان ١٣٠٠
قەڵەمڕەوی عوسمانییەکان لە نێوان ساڵانی ١٣٠٠-١٣٥٩
قەڵەمڕەوی عوسمانییەکان لە نێوان ساڵانی ١٣٥٩-١٤٥١
قەڵەمڕەوی عوسمانییەکان لە نێوان ساڵانی ١٤٥١-١٤٨١
قەڵەمڕەوی عوسمانییەکان لە نێوان ساڵانی ١٥١٢-١٥٢٠
قەڵەمڕەوی عوسمانییەکان لە نێوان ساڵانی ١٥٢٠-١٥٦٦
قەڵەمڕەوی عوسمانییەکان لە نێوان ساڵانی ١٥٦٦-١٦٨٣
750 miles
1000 km

RUSSIAN EMPIRE

AUSTRO-HUNGARIAN EMPIRE

autonomous 1817; independent 1878

BESSARABIA to Russia 1878

ROMANIA autonomous 1859; independent 1878

BOSNIA-HERZEGOVINA annexed by Austria-Hungary 1908

SERBIA

MONTENEGRO independent 1878

BULGARIA autonomous 1878; independent 1908

ALBANIA independent 1912

ITALY

GREECE independent 1830

Crimea

Black Sea

Caspian

Constantinople (Istanbul)

ANATOLIA

TURKEY

ARMENIA independent 1918–20

TUNIS French protectorate 1881

Malta British

Dodecanese occupied by Italy, 1912

Crete to Greece 1898

Cyprus to Britain 1878

Mediterranean Sea

SYRIA British occupation 1918; French mandate 1920

PERSIA

IRAQ Hashemite kingdom under British mandate 1920

British occupation 1917; British mandate 1920

PALESTINE

TRANS-JORDAN under British rule 1923

TRIPOLITANIA to Italy 1911

CYRENAICA to Italy 1911

ALGERIA French

FEZZAN to Italy 1911

KUWAIT British protectorate 1899

Ottoman 1875; occupied by Saudis 1913

EGYPT independent dynasty under Muhammad Ali 1805; occupied by Britain 1882; British protectorate 1914

NEJD under Saudi family from 1746; subdued by Egypt 1812–20; Saudi control over most of Arabian peninsula established by 1926

HEJAZ

Red Sea

FRENCH WEST AFRICA

ANGLO-EGYPTIAN SUDAN ruled from Egypt 1820; indigenous rule under Mahdist regime 1882; Anglo-Egyptian condominium 1898

ERITREA to Italy 1889

YEMEN independent 1918

ADEN British influence 1839; British protectorate 1886

ABYSSINIA (ETHIOPIA)

**ئیمپراتۆریەتی عوسمانی**
**لە نێوان سالآنی ١٧٩٨-١٩٢٣**

- ئیمپراتۆریەتی عوسمانی سالْی ١٧٩٨
- لە دەستچووی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە سالْی ١٨٨٦
- لە دەستچووی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە سالْی ١٩١٤
- سنووری رۆژهەلاتی (بەناو) عوسمانییەکان لە سالْی ١٩١٣
- سنووری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە سالْی ١٩١٤
- لە دەستچووی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە سالْی ١٩٢٠
- ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ماوەی رێککەوتنی سیڤەردا ١٩٢٠
- ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ماوەی رێککەوتنی لۆزان ١٩٢٣





لیواکانی عێراق لە سەردەمی عوسمانییەکان لە ساڵی ١٩١٤




شوێنی کەرکوك لە نەخشەی کوردستاندا
کتێبی شەرەفنامە


شوێنی کەرکوك لە ڕێککەوتنامەی سایکس بیکۆ ساڵی ١٩١٦
تركيا
سورية
كركوك
إيران
دمشق
بغداد
حيفا
القدس
عمان
مصر
البصرة
الجزيرة العربية
منطقة دولية
منطقة أ
نفوذ فرنسي
منطقة زرقاء
سيطرة فرنسية مباشرة
منطقة ب
نفوذ بريطاني
منطقة حمراء
سيطرة بريطانية مباشرة


Black Sea
Russia
Ankara
Turkey
Caspian Sea
Sivas
Lake Van
BLUE ZONE
(direct French control)
Lake Urmia
Tabriz
Adana
Mersin
Alexandretta
Mardin
Aleppo
Mosul
Persia
'A' ZONE
(under French influence)
Kirkuk
Cyprus
Hama
Hamadhan
Homs
Mediterranean Sea
Damascus
Baghdad
Haifa
'B' ZONE
(under British influence)
Karbala
RED ZONE
(direct British control)
INTERNATIONAL ZONE
Jerusalem
Amman
Najaf
Basrah
Arabia
Egypt
Aqaba
Kuwait
Hijaz
Persian Gulf
Red Sea
شوێنی کەرکوك لە ڕێککەوتنامەی سایکس بیکۆ ساڵی ١٩١٦
200 Miles


TURKEY
ZAKHO
DUHOK
SYRIA
IRAN
SINJAR
MOSUL
ARBIL
MAKHMUR
SULAIMANYA
KIRKUK
نەخشەی پێشکەش کراو بۆ
لیژنەی رەشنووسی دەستوور
TUZ
KIFRI
TIKRIT
KHANAQIN
ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستانی عیراق
ناوچەکانی کوردستان کە لە ژێر
دەسەڵاتی حکومەتی مەرکەزیدان
DYALA
MANDALI
BAGHDAD

## * پێشبینییەکانی ئەسیری لەمەڕ کەرکوك:

شاعیر (ئەسیری) ئاگاداری مێژووی کوردان بووە، برێ کتێبی وەکو (الطبري و ابن الاثير) ڕەنگە (مەسعودی)و ئەوانی ترو ساڵنامەی سێ سەدەی تورکان و کتێبی دکتۆر (فریجی) ئەڵمانی خوێندوەتەوە. هاتووە باسی (مێژووی شاری کەرکوك)ی بەشیعر بۆ درکاندوین و باسی بنەچەو دروستکردنی شارەکەو دانیشتووانی ڕەسەنی کوردیمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەڵێ کەرکوك شارێکی کوردو کوردستانە، ئەوانەی تیایدا بەدرێژایی مێژوو نیشتەجێ بوون، هەموو کورد بوون و شاهیدی قسەکانم وەك دۆکیومێنت ئەو کتێبانەیە. دیارە شاعیر هەستی کردوە کە کەرکوك و کفری تەعریب دەکرێن و دانیشتووانە ڕەسەنەکەی دەردەکرێ و پاشە ڕۆژیش قەومەکەی دەبێ شەڕی لەسەر بکات تا دەیانگێڕێتەوە سەر کوردستان لەبەر ئەوە کێشەکەی بەکێشەی ئەو دوو شارە سەر سنوورییەی ئەڵمانیا و فەرەنسا چواندووە بەناوەکانی (ئەلزاس)و (لۆرەن):

لێ وەرگیراوی ئەم تەئریخانە
تەبەری و ئاساری هەروتیانە
ساڵنامەی سێ سەدەی تورکانە
کتێبی دکتۆر (فریجی) ئەڵمانە
کەرکوك ئەلزاسە، کفری لۆرەنە
دڵ سووتاویانە هەرچی کورد هەنە[1]

ئەگەر بێت و لە هەڵسەنگاندنێکی مێژووییەوە سەیری کەرکوك بکەین بە چاوی ئەوەی کە (ئەسیری) لە شیعرەکەدا ئاماژەی پێ کردووە ئەوە دەخاتە ڕوو کە شارەزایی لە هەڵسەنگاندنی مێژوودا هەبووەو گەلێك شوێنی وەکو کەرکوك لە سەردەمانێکدا تووشی گەلێك گێرمەو کێشەی سنووری بوونەو بەشێکی تاوەکو ئێستاکە وەکو کەرکوك بەدەست سیاسەتە جۆربەجۆرەکانەوە دەناڵێت، بۆ نموونە کە باس لە (ئەلزاس)و (لۆرین) دەکات ئاماژەیەکی تەواوە بۆ بەراورد کردنی لەگەڵ کەرکوك لە ڕووی ئەوەی کە ماوەیەکی دوورو درێژە لەلایەن دوژمنانی کوردەوە داگیر کراوەو هەقی خۆی کە بۆ کوردستانە نەگێردراوەتەوە.

(لۆرین) ئاقارێکە لە ڕۆژهەڵاتی فەرەنسا لەسەر سنووری ئەڵمانیای ڕۆژئاوا[2] لەنێوان چیای (ڤۆج)و حەوزی پاریسی کە پێکهاتووە لە پارێزگاکانی: (مۆز، مۆزل، ڤۆج، مۆرت) کە مۆزل شارەکانی بریتییە لە (نانسی، متز، ئەپینال) هەروەها بەناوبانگە بە (غەڵووزو ئاسن و خوێ)[3].

(ئەلزاس) ناوچەیەکی مێژووییە لە ڕۆژهەڵاتی فەرەنسا لەسەر ڕووباری (ڕاین) کە ژمارەی دانیشتووانی بریتییە لە (١,٦٢٤,٣٧٢) ملیۆن کەس، بنکەی بەڕێوەبردنەوەی بریتییە لە (ستراسبۆرگ)، هەر یەکە لە (لۆرین)و (ئەلزاس) ئاقارێکی فراوانیان دروست کردووەو لە ساڵی (١٨٧١)دا ئەڵمانیا دەستی گرت بە سەریداو فەرەنسا لە شەڕی جیهانی یەکەمدا گەڕاندییەوە سەر زێدی خۆی[4].

ئەوەی ڕاستی بێت لەنێوان ساڵانی (١٨٧٠ – ١٨٧١) جەنگێکی بەرفراوان لەنێوان فەرەنساو ڕووسیا هەڵگیرسا بە هەڵاتنی هێزەکانی فەرەنسا، ئەمەش بە هۆی بەرهەڵستکاری (ناپلیۆنی سێیەم)و بووە هۆی لە دەستدانی فەرەنسا لە هەرێمەکانی (ئەلزاس)و (لۆرین)و بووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئیمبراتۆریەتی دووەم دامەزراندنی سێیەم کۆماری فەرەنسی[5].

ئەم بنەما دبلۆماسییەی ئەورووپا لە دوای شەڕی (سیدان) تا (٢)ی ئەیلولی ساڵی (١٨٧٠) ئامانجی فەرەنسا لەوەدابوو کە سەرکەوتنەکانی (بروسیا)ی پێشوو لابدات و کاریگەری فەرەنسی بەسەر (ڕاین)ەوە بێت، بەڵام لە دوای ئەیلولەوە فەرەنسییەکان گەیشتنە ئەو قەناعەتە کە پێویستە دان بە یەکگرتوویی ئەڵمانیا بکەن و تەنها بایەخ بە یەکێتی پاراستنی زەوییەکەیان بدەن، بۆیە ئەڵمانیا هەر یەکە لە (ئەلزاس)و (لۆرین)ی کردە سەر زەوییەکانیان[6].

سەرکەوتنەکانی نێوان ساڵانی (١٨٧٠ – ١٨٧١) لە پاڵ (ئەلزاس)و (لۆرین) غەرامەی (٥) ملیۆن فرانکیش کرایە سەر فەرەنساو بوو بە سەرکەوتنێکی گەورە بۆ ئەڵمانیا[7].

لە دوای ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر ئەورووپادا هات لەنێوان شەڕی جیهانی یەکەمدا، فەرەنسا توانی هەردوو ئەو ئاقارە بگەڕێنێتەوە سەر دەوڵەتەکەی و لە ئەڵمانیا دابڕێتەوە.

جیاوازی و لێکچوونی کەرکوك لەگەڵ ئەو دوو ئاقارە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە:

١. بەربەرەکانی گەڕانەوەی (ئەلزاس)و (لۆرین) لەنێوان دوو دەوڵەتی سنوورییە، بەڵام کەرکوك و کفری دوو بەشی چوارچێوەی عێراقن لە کوردستانی باشووردا.

٢. هەردوو شوێنەکان گرنگی و پێویستی خۆیان هەیە لە ڕووی ئابوورییەوە بۆ ناوچەکە، بەڵام بیرکردنەوەی سیاسەتی حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بیرکردنەوەیان لە سیاسەتی تەعریب و ڕاگواستن ئەوەی یەکلاکردۆتەوە کە لە ڕووی بیر تەسکی سیاسییەوە هەردەم کێشەکان بە ئاڵۆزی ماوەتەوە.

٣. سیاسەتی حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کە هیچ کاتێك نەیانویستووە بە دانووساندن کێشەکان چارەسەر بکەن، بۆیە هەردەم ڕێگەی سەربازی لە بەردەم چارەسەرەکاندا بووە.

ئەوەی گرنگە لێرەدا بیڵێین بیر تیژی (ئەسیری) لەو کاتەدا یان هەستکردنی بە سیاسەتی ئەو کاتەی عێراق ئەوەی لەلا پشتڕاستبۆتەوە کە لە دوارۆژدا هەر یەکە لەو دوو ناوچەییەی کەرکوك و کفری دەکرێنە یان دەخرێنە دوو پارێزگای جیاواز، هەر وەکو ئەوەی کە لە ساڵی (١٩٧٥)دا کفرییان خستە سەر پارێزگای دیالەو دایان بڕی لە پارێزگای کەرکوك، لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە خرایە سەر هەرێمی کوردستان.

بۆیە بیرکردنەوەی ئەو کاتەی شۆفینیزمی عەرەبی ئەوەی لێ ڕچاو کراوە کە یەکێکی وەکو (ئەسیری) هەستی

بە سیاسەتی ئەو سەردەمەی عەرەب کردبێتو لە بۆنە جیاجیاکاندا درکیان بەوە کردبێت کە کەرکوك لە رووی ئابوورییەوە دەوڵەمەندیو گرنگی خۆی هەبێت، بۆیە ویستوویانە هەموو ناوچەکانی لێ دابڕن تا بۆ ئەوەی سیاسەتی تەعریبو ڕاگواستن جێبەجێ بکەن.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**


١. گۆڤاری (کەرکوك)، ژمارە (١)، ساڵی هەشتەم، پاییزی ٢٠٠٧، لاپەڕە (٢٢٥-٢٢٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (ئەسیریو هەستی نەتەوایەتی)، نووسینی: هاشم کاکەیی.
٢. (المنجد في اللغة والاعلام)، لویس مەعلوف، کتێبخانەی (الشرقیة)، ١٩٨٦، لوبنان، چاپخانەی (کاثولیکي)، چاپی بیستو چوارەم، لاپەڕە (٦١٥).
٣. (المنجد في الاعلام)، لویس معلوف، (مؤسسة انتشارات دار العلم)، لاپەڕە (٤٩٧).
٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٣).
٥. (فەرهەنگی ڕووداوەکانی کوردستانو وڵاتانی جیهان)، عەلی کەندی، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥، لاپەڕە (١٩١).
٦. (الصراع علی السیادة في اوروبا ١٨٤٨ - ١٩١٨)، ئەی. جی. پی. تایلەر، وەرگێڕانی: د. کازم هاشم نیعمە، د. یۆنێل یوسف عەزیز، زانکۆی موسڵ، لاپەڕە (٢٥٢ - ٢٥٣).
٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٥٩).

*** کەرکوك لە چەند راپۆرتێکی (گرووپی قەیرانی نێودەوڵەتیدا):**

*** عێراق و کورد، بەردەوامیی گرفتەکان:**

"دەقی راپۆرتی (گرووپی قەیرانی نێودەوڵەتییەکان):

ماوەی ساڵێك توندوتیژی لە عێراق کەم بووەتەوە. بەڵام ئێستا کێشەیەکی دیکەی سیاسی گەورە سەری هەڵداوە. ئەو کێشەیە لەنێوان حکومەتی فیدراڵ و حکومەتی هەرێمی کوردستاندایە، لە دانوستانەکانی نێوان بەرپرسانی هەردوو لا و چالاکییە سەربازییەکانیشدا رەنگی داوەتەوە. ئەمەش زەنگێکی مەترسیدارە بۆ بەرپرسانی ئیدارەی (ئۆباما)، لە کاتێکدا دەیانەوێت سوپای وڵاتەکەیان بەرەبەرە لە عێراق بکشێننەوە. تەنیا چارەی گونجاو و هەمیشەیی بۆ ئەم کێشەیە دەبێت سیاسی بێت و چەند شتانێکی زۆر سەرەکی یەکلا بکاتەوە، لەوانەیش شێوازی دابەشکردنی دەسەڵات و سامانە سروشتییەکان و سنووری هەرێمی کوردستان.

*** کەرکوك و قووڵتربوونەوەی کێشەکە:**

یەکێك لە هۆکاری کێشەکان، بریتییە لە کەرکوك، لەم شارەدا سێ پێکهاتەی سەرەکی هەن، ئەوانیش کورد و عەرەب و تورکمانن. شارەکە لە هەبوونی نەوت و گازدا زۆر دەوڵەمەندە، لە پاش ساڵی (٢٠٠٣)یش هێزی پێشمەرگەی جێگیر بوو کە پێش شەڕەکە لە دەرەوەی کۆنترۆڵی ئەواندا بوو.

(ئەو ناوچانە کوردین و بەشێکن لە خاکی هەرێمی کوردستان و پێویست بوو لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٧) چارەنووسیان دیاری کرابوایە و بگەڕێندرابانایەوە سەر سنووری هەرێمی کوردستان. هێزی پێشمەرگەی هەرێمی کوردستان لە هەندێك شوێنی وەکو موسڵیش رۆڵی دابینکەری ئارامی و ئاسایشی گێڕاوە و مەبەستیش لە مانەوەی پێشمەرگە دەست بە سەرداگرتن بەسەر موسڵدا نەبووە).

لە مانگی ئابی ساڵی (٢٠٠٨)ەوە کێشەی نێوان حکومەتی ناوەندی و حکومەتی هەرێمی کوردستان زیاتر قووڵ بووەتەوە. جێگیرکردنی یەکەی (١٢)ی سوپای عێراق لە چەند ناوچەیەکی کێشەدارو هەوڵدان بۆ دەرپەڕاندنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەو ناوچانە، بە شێوەیەکی گشتی کوردی تووڕە کرد.

*** پرسی نەوت و گازو رۆڵی حکومەتی ئەمریکا لە چارەکردنی کێشەکەدا:**

یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی گرژبوونی پێوەندییەکانی نێوان هەردوو لا، پێوەندیی بە پرسی دەرهێنانی نەوت و گازەوە هەیە. تا ئێستا یاسای تایبەت بە نەوت و گاز لە پەرلەمانی عێراق دەرنەچووە، پێوەندییەکی زۆر لاواز لەنێوان بەرپرسانی حکومەتی ناوەندی و حکومەتی هەرێمی کوردستاندا هەیە، هەر بۆیەش رەنگە کێشەی زۆر بچووك بەرەبەرەو لەگەڵ تێپەڕبوونی کات گەورە بێت. کشانەوەی سوپای ئەمریکا لە عێراق کاتێك زۆری نەماوە. ئەمەیش واتای ئەوەیە کە حکومەتی ئەمریکا رۆڵی لە چارەکردنی کێشەکاندا کەمتر دەبێتەوە.

پێویستە کێشەی نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی ناوەندی پێش هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکانی سەرەتای ساڵی داهاتوو چارە بکرێت. ئەگەر حکومەتی ئەمریکا دەیەوێت بێ ئەوەی ناچار بکرێت عێراق بە جێبهێڵێت یان پێویست بکات پێگەیەکی سەربازیی بەهێزی لەو وڵاتەدا هەبێت، ئەوا پێویستە بەرپرسانی ئەمریکا گوشار بخەنە سەر عێراقییەکان بۆ ئەوەی بگەنە رێککەوتن. ئەو گوشارانەیش پێویستە زیاتر لە کاتی دەرکردنی یاسایەکی تایبەت بە نەوت و گاز لە پەرلەمانی عێراقدا و چارەکردنی کێشەی کەرکوك و ناوچە کێشەدارەکانی دیکە و شێوازی دابەشکردنی دەسەڵاتدا بە دیار بکەون و بەکار بهێنرێن.

پێویستە حکومەتی ئەمریکا رۆڵێکی ئەکتیڤ و کارا لە بەهێزکردنەوەی پێوەندییەکانی نێوان حکومەتی ناوەندی و حکومەتی هەرێمی کوردستاندا بگێڕێت. لە هەمان کاتیشدا پێویستە ژمارەیەکی سەربازی سوپای ئەمریکا لە عێراق بمێنێتەوە بۆ ئەوەی رێگە لە زیاتر گرژبوونی بارودۆخەکە بگرێت. پێویستە حکومەتی ئەمریکا پاڵپشتی تەواوی خۆی بۆ تیمی یارمەتیی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان (یۆنامی) دووپات بکاتەوە. ئەو تیمە هەوڵ دەدات گرفتی ناوچە کێشەدارەکان و شێوازی دابەشکردنی دەسەڵات و سامانە سروشتییەکان چارە بکات.

*** پێشنیازەکانی گرووپ بۆ حکومەتی عێراق و هەرێمی کوردستان:**

١. دەست بە دانووستان بکەنەوە بۆ چارەکردنی کێشە ریشەییەکان، لەوانەیش: چالاککردنی پێنج لیژنەکە لە بەغدا، هەوڵدان بۆ چارەکردنی کێشەی دابەشکردنی دەسەڵات، ئاسایش و پێشمەرگە، سیاسەتی دەرەوە و هەروەها ئابووری و نەوت و گاز، سەرباری دەستپێکردنەوەی دانوستانەکان بۆ چارەکردنی گرفتی ناوچە کێشەدارەکان.

٢. نابێت گرفتی ناوچە کێشەدارەکان گەورەتر بکرێت، پێویستە هیچ گرێبەستێکی بۆ دەرهێنانی نەوت یان گاز لەو ناوچانەدا مۆر نەکرێت. پێویستە رێنمایی راست و دروست بدرێتە سوپای وڵات، سوپا و پێشمەرگەیش پێکەوە کردەی سەربازی دژی گرووپە تێکدەرەکان ئەنجام بدەن.

٣. نابێت زمانی رەق و رەخنەگرتن بەرانبەر بە یەکدی بەکار بهێنن.

لە کۆتایی راپۆرتەکەیشدا ئاماژە دراوە کە پێویستە حکومەتی ئەمریکا گوشارێکی گەورە بخاتە سەر بەرپرسانی حکومەتی عێراق بۆ ئەوەی هەوڵی چارەکردنی کێشەکان بدەن".

* سەرچاوەکان:-

- رۆژنامەی هەولێر، ژمارە ٥٧٦

*** هێورکردنەوەی دڵەڕاوکێکانی تورکیا لە بارەی ئاواتەکانی کوردەوە:**

ڕاپۆرتی ڕۆژهەڵاتی ناوین. ژمارە (٣٥) لە ئەنقەرە، عەممان، برۆکسل، لە ٢٠٠٥/١/٢٦

**پێشەکی:**

ئەوت لە کرۆکی ئەو بارگرژییانەدایە کە بەردەوام لە کەرکوکدا ڕوو لە زیادبوون و هەڵچوونی زیاترن. ئەمە قەیرانێکە لەوانەیە تا ڕادەی شەڕێکی بەربڵاو لەنێوانی هەموو ئەو کۆمەڵانەی پێکهاتەی شارەکەو ناوچەکانی دەوروبەری پێکدەهێنن، پەرە بگرێ. تەنانەت لەوانەیە بگاتە ڕادەی شەڕێکی ناوخۆیی و تورکیای باکوور هاوسێی عێراقیش دەخالەتی تێدا بکات[١]. کەچی هاوکات پرسیاری جددیش لە بارەی برو جۆری ئەوتەکەی کەرکوکەوە هەیە. ئەوەی بە ووردی زانراوە ئەوەیە لەم ناوچەیەدا بری (١٠) ملیۆن ئەوتی یەدەگ لە ژێر خاکەکەیدایەو دەکاتە نزیکەی (١٠٪) کۆی یەدەگی عێراق[٢]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە بیرە ئەوتەکانی کەرکوك و دەوروبەری دووەمە لە دوای بیرەکانی ڕومێلە لە باشووری عێراق[٣].

ئەم سامانە بەسەر ژیانی ئابووری ناوچەکەدا زاڵەو، کۆمپانیای ئەوتی باکوور (NOC) لە دوای حکوومەت گەورەترین ناوەندی دامەزراندنی دەستی کارە لە عێراقدا. بەم هۆیەشەوە کەرکوك بۆتە ناوەندی کێشکردنی کارگەران، هەروەها جێنیشانەی بەرنامەکانی حکومەتەکانی پێشوو بووە، کە بۆ ساڵانێکی زۆر ئیشیان لەسەر گۆڕینی هاوسەنگی دانیشتووانەکەی کردووە. لەم چوارچێوەیەشدا هەڵمەتی تەعریبکردنی ئەم شارەو دەوروبەری کراوەو بە هەر شێوەیەك بووە دەیان هەزار کوردو تورکمانی گوندەکانی ئەم شارە دوورخراونەتەوە یان ناچارکراون کە لە کۆمەڵگا زۆرەملێکاندا بژین و مافی موڵکایەتی زەوییان نەبێ[٤]. هەروەها کوردەکان لە ناو خودی شاری کەرکوك دەرکراون یان وەکو تورکمانەکان ڕێگەیان پێ دراوە بمێننەوە بەو مەرجە کە ئینتیمای ئیتنی و نەتەوەییان بگۆڕن بۆ عەرەب. ئەم کارە بە زاراوەی بەعسیان پێی گوتراوە (تصحیح قومیة) پارێزگای کەرکوك کە ناوەکەی ئەمیشیان گۆڕی بووە بۆ (التأمیم) دووچاری تصحیح قومییەکی تایبەت بە خۆی بووە بەوەی ڕژێم بەشی گەورەو فراوانی خاکەکەی کە کوردو تورکمان زۆرینەی دانیشتووانەکەی بوون، لکاندوویەتی بە پارێزگای دیکەوە[٥].

*** قەیرانی پەرەگرتوو لە کەرکوك:**

**أ. سیاسەتی گەڕانەوە:**

لە ماوەی ساڵانی (٢٠٠٣)و (٢٠٠٤)دا ئەو کوردو تورکمانانەی پێشتر ڕاگوێزرابوون و لە کەرکوك و دەورووبەرەکەی دەرکرابوون، ئەو دەرفەتەیان قۆستەوە کە ڕژێم رووخێنرا بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان، یان ئەگەر گوندو ناوچەکانیان وێرانکرابن یاخود مینرێژکرابن ئەوا بچنەوە ناو کەرکوك و لەژێر چادرو ڕەشماڵدا بۆ ماوەی چەندین مانگ لە بێبەشی و پیس و پۆخڵیدا بژین[٦]. گوندییەکان هەر ئەوەندە نییە کە ماڵ و حاڵیان نەماوە بگەڕێنەوە سەری، بەڵکو لەوەش زیاتر بەشێکی یەکجار کەمیان حەزیان بەوە ماوە بچنەوە سەر کاری کشتوکاڵ کە ساڵانێکی زۆرە لێی دوورخراونەتەوە[٧].

گەڕانەوەی بەلێشاوی ئەمان بۆتە هۆی تێکچوونی پارسەنگی دیمۆگرافی شارەکەو، ڕێکخراوی نێودەوڵەتی کۆچ (IOM) لە ساڵی (٢٠٠٤)دا ڕایگەیاندووە کە (١٢) هەزارو (١٣٥) خێزانی کوردو (٣) هەزارو (٩٢٥) خێزانی تورکمان گەڕاونەتەوە بۆ کەرکوك و دەورووبەری[٨].

هەرچەندە کوردو تورکمان، هەردووکیان قوربانیی دەستی ڕژێمی پێشوون، بەڵام گەڕانەوەی ڕاگوێزراوەکان لە کاریگەرییەکانی سیاسەت بێبەش نەبووە. لە پاڵ ئەوەشدا هەردوو حیزبە کوردییە سەرەکییەکە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ئیدارەی شارەکەو دامودەزگا ئەمنییەکانیان قۆرخ کردووەو بووەتە هۆکارێکی سەرەکی ئەو بارگرژییەی لەنێوانی کوردو تورکماندا هەیە. بە قسەی دانیشتووانە غیرە کوردەکەی کەرکوك بێت (PDK)و (PUK) هانی کوردە دوورخراوەکانیان داوە لە پارێزگا کوردییەکان و تەنانەت لە ئێران و تورکیاشەوە بگەڕێنەوە بۆ کەرکوك ئەگەر چی کەرکوکییش نەبن بۆ ئەوەی بەر لە سەرژمێری یان هەڵبژاردن یاخود ریفراندۆمێکی پێشبینیکراو بۆ چۆنێتی بەڕێوەبردنی ناوچەکە ژمارەی کورد لە شارەکە زیاد بکات[٩].

بەپێچەوانەی ئەوەشەوە حیزبە کوردییەکان دەڵێن ئەوان هەوڵیانداوە نەهێڵن گەڕانەوە بە لێشاو بێ و، ئەوەیشی گەڕاوەتەوە ئەگەر هەموویشی نەبێ، بەڵام زۆربەی هەرەزۆریان خەڵکی ڕەسەنی شاری کەرکوك و پارێزگاکەن.

لەوانەیە بەڵگەو بنەما بۆ قسەی هەردوو تەرەفەکە هەبێ، لەلایەکەوە بەڵگەی ئەوە هەیە، کە لە کۆتایی هاوینی ساڵی (٢٠٠٤)دا کاریگەرییەکی زۆری سیاسەت لەسەر پرۆسەی گەڕانەوە هەیە. کاتێك ساڵی نوێی خوێندن دەستی پێکردو دەرکەوت قوتابخانەو مامۆستاو کەرەستەو کتێبی کوردی کەمن، ئینجا خێزانە کوردەکان زانیان منداڵەکانیان ناتوانن درێژە بە خوێندن بدەن، ئەو کەلوپەلە کەمەی هەیان بوو پێچایانەوەو گەڕانەوە بۆ هەولێر یان سلێمانی. لە هەمان ماوەدا ڕاگەیەنرا کە ئەو سەرژمێرییەی بڕیار بوو لە (١٢)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤)دا بکرێ دواخراوە بۆ کاتێکی نادیارو ئیتر ئەوەی کە دەبێت کورد دەستبەجێ

بگەڕێنەوە بۆ کەرکوك خاو بۆوە. لەسەر ئەم بنەمایە کە غەیرە کوردەکانی کەرکوك دەڵێن: (سەرنج بدەن حیزبە کوردییەکان بۆ ئەوەیان نەبوو کورد بگەڕێتەوە لە کەرکوك بژین، بەڵکو هەر بۆ ئەوەیان بوو لە سەرژمێرییەکەدا لە کەرکوك تۆمار بکرێن)[10].

لەلایەکی ترەوە ئەو کوردانەی لە نەهامەتییەکی زۆردا لە کەرکوك دەژین و ئەوانەشیان کە ڕاگوێزرابوون و هێشتا لە پارێزگاکانی دیکە دەژین بە سوێوە گلەیان لە سەرکردایەتی کورد دەکرد کە نەیتوانیوە پشتگیری لۆجیستی و سیاسی و مرۆیی بۆ گەڕانەوەی ئەمان دابین بکات، لە کاتێکدا ئەمان زۆریان خەون بەوەوە بینیوە عەرەبە هاوردەکان دەربکرێن و ئەمان بگەڕێنەوە بۆ کەرکوك. ئەمەش لەلایەنی کەمیدا نیشانەی ئەوەیە کە حیزبە کوردییەکان بە تەحەفوزەوە کاردەکەن چونکە لەلایەن نوێنەرانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە بە وردی چاودێری دەکرێن[11]. لەسەر مۆڵکایەتی، گەڕانەوەی کوردە ڕاگوێزراوەکان نەبووە هۆی ناکۆکی و شەر لەگەڵ عەرەبە نیشتەجێکراوەکاندا[12]. چونکە زۆربەی کوردە دەرکراوەکان لە بنەڕەتەوە کرێچی بوون نەك خاوەن موڵك، ئەوانەش کە دەرکراون بەر لەوە بە چاوی خۆیان دیتوویانە کە ماڵەکانیان وێرانکراوە یان فریاکەوتوون داویانە بە خزمێکی خۆیان.

لێ گوندە کوردییەکان هەموویان کاولکراون و نەهێڵراون (بە قوتابخانەو مزگەوت و بیری ئاوە کانیانەوە). هەندێ حاڵەت نەبێ کە عەرەبە هاوردەکان خانووی سادەو ساکاریان لەو شوێنانە دروست کردۆتەوە کە کوردەکان گەڕانەوە وێرانیان کردن. ڕژێمی پێشوو کە دەستی بەسەر موڵکی کوردەکاندا دەگرت، دەیکردن بە دامودەزگای گشتی لەوانەش نووسینگەو بارەگای حیزبەکەی، کەواتە هەر لە بناغەوە ناکۆکییەك نەماوە سەبارەت بە موڵکایەتی کوردەکان، بەڵکو کێشەیەك هەیە ئەویش کێشەی گەڕانەوەی کوردە بۆ سەر ماڵێك کە نەماوە. زۆربەی عەرەبە هاوردەکانیش گواستوویانەتەوە بۆ گەڕەکی دیکە[13]. ئەو حاڵەتەش کە عەرەبەکان (بە شێوەیەکی ڕەوا بووبێ یا ناڕوا) موڵکیان دەستکەوتبێ کە بە ئەسڵ هی کورد یان تورکمان بووبێ، پاش ڕووخانی ڕژێم دانیان بەوەدا ناوە کە بەهانەکانیان لاوازەو ئامادەن چۆڵی بکەن (هەندێ جار لە ژێر فشاردا ئەم ئامادەییەیان نیشانداوە)[14].

تا هەنووکە کێشەی سیاسی و مرۆیی پەیوەندیدار بە گەڕاندنەوەی دەیان هەزار کوردی دەرکراوەوە هەیە، کە مەسەلەیەکی کڵپەکردووەو بە شێوەیەکی مەترسیدار بارگرژی دەنێتەوە، دەبێت دان بە بوونیدا بنرێ و چارەسەر بکرێ.

### ب. مەترسی بەرپابوونی ناکۆکی کۆمەڵایەتی:

باڵادەستیی کورد لە کەرکوك لە سەرلەنوێی ناونانەوەی شەقام و دامودەزگاکاندا دەردەکەوێ (بۆ نموونە نەخۆشخانەی (سەدامیان گۆڕیوە بە ئازادی)، ئاڵای کوردستانیان هەڵکردووە، حیزبە کوردییەکان دەستیان بەسەر خانووبەرە گشتییەکان و بارەگاکانی حیزبی بەعسدا گرتووە. ئەوەندەش ئیجرائی ڕەمزی و ئاشکراوانەیان کردووە، کە بوونەتە هۆی ناڕەزاییەکی زۆری ناوەندە غەیرە کوردەکان[15]. حیزبە کوردییەکان و نوێنەرانی دیکەی کورد لە ئەنجوومەنی پارێزگاو فەرمانگەکان و لیژنەی عەقاراتی عێراقی و لیژنەی دوورخراوەکان (غەیرە کوردەکان ئەم نوێنەرایەتییە بە زۆر لە قەڵەم دەدەن) دەستیان بەسەر ژیانی سیاسیدا گرتووەوە بەرپرسە کوردەکانیش بە ئاشکرا ئەوە ڕادەگەیەنن کە نیازیانە دەست بەسەر کەرکوکدا بگرن و بیلکێنن بە ناوچە کوردییەکەوە[16].

کلدانە ئاشوورییە مەسیحییەکان ڕۆڵێکی بنەڕەتی دەگێڕن لە هێورکردنەوەی بارگرژییەکاندا. بەبێ لایەنانە خۆیان هێشتۆتەوەو سێ گەورە کۆمەڵە ڕکابەرەکە ترسیان لێیان نییە، بێدەنگن و هەرکاتێکیش داوایان لێ کرابێ ناوبژیان کردووە[17].

تەنانەت چاودێرێکی ڕۆژئاوایی دەڵێ: (کۆمەڵەکانی ناو کەرکوك لەسەر هیچ ڕێکنەکەوتن لەسەر ئەوە ڕێکدەکەون کە مەسیحییەك ناوبژییان بکات)[18].

یەکێك لە ڕکابەرە سەرەکییەکانی کورد تورکمانە کە هەندێکیان بۆ نموونە ئەو چوار حیزبە نوێنەرایەتیان دەکەن، کە پێیان دەوترێت (نیشتیمانی) و لەبەری تورکمانیدا کۆبوونەتەوە. ئەم بەرەیە دەستکردی تورکیایەو بە زۆری تورکمانە سوننە مەزهەبەکانی تێدایەو لەلایەنی زۆرینەی تورکمانەوە بەچاوی گومانەوە سەیر دەکرێ، چونکە گومان لە کۆمەڵەگە نیشتیمانییەکانی ڕێکخراوێك دەکەن، کە بیانی دروستی کردبێ. هەرچەندە هەندێ لە تورکمانە شیعەکانیش هاتوونەتە ریزی ئەم بەرەیەوە، بەڵام بەشە هەرە زۆرەکەی بە سەرۆکایەتی ڕابەری ڕوحییان ئایەتوڵڵا عوزما عەلی حوسێن سیستانی حیزبی خۆیان دامەزراندووەو وایێ دەچێ لەوەوە ڕێنمایی وەرگرن[19].

عەرەبەکان تەواو لێکتر ترازاون و دابەشی دوو پۆل بوون. یەکەمیان عەرەبە ڕەسەنەکانی کەرکوك کە لە ناوچەکانی (ئەلحەدیدی و عوبێدو ئەلجبور)دان، دووەمیشیان عەرەبە هاوردەکان کە ڕژێمی بەعس هێناونی و لێرە نیشتەجێی کردوون. ئەوانەی یەکەم سوننەن و دووەمیشیان شیعەی باشوورن. دانیشتووانە ڕەسەنەکەی کەرکوك هەر هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە دەبێ عەرەبە هاوردەکان هەرچییەکیان لە موڵك و ماڵ بە ناهەقی دەستکەتووە بیگەڕێننەوە بۆ خاوەنەکانیان. هەروەها زۆربەشیان لەسەر ئەوە کۆکن کە دەبێ خۆشیان بگەڕێنەوە بۆ سەر زێدی ڕەسەنی خۆیان جا لە هەر جێیەك بێت و خانووی لەوێ هەبێت یان نەبێت (لانی زۆر وا پێ دەچێت خانووبەرەیان نەمابێت)، بەڵام سەرەڕای ئەم کۆکییە ئەمان لەبارەی چۆنێتی و کاتی گەڕاندنەوەی ئەم هاوردانە ڕای جیاوازیان هەیە. کوردەکان سوورن لەسەر ئەوەی ئەمڕۆ بەر لەسبەی بگەڕێنرێنەوە، دەکرێ قەرەبووش بکرێنەوەو ئامرازەکانی گواستنەوەشیان بۆ مەیسەر بکرێ، بەڵام بە دڵنیاییەوە دەبێت بەر لە هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی پارێزگاکان یان سەرژمێریی یان ڕیفراندۆم بێ. کەچی لە

لایەکی دیکەوە عەرەبی رەسەنو تورکمانیش هەن، چونکە خانووەکانی خۆیان بەمان بەکرێ داوەو هێزێکی هەرزانی کارن کە لە ئایندەیەکی نزیکدا پێویستیان پێیان دەبێت بۆ ئیش کردن لە پێناو ئاوەدانکردنەوەدا، لەمانەش گرنگتر ئەوەیە کە بەشداری دەنگدان دەکەن لە هەڵبژاردنەکانداو لە توانای کورد کەم دەکەنەوە.

هەوڵی کوردەکان هەر بۆ ئەوەندە نییە کە دیفاکتۆیانە یان شەرعییانە زاڵ بن بەسەر شارەکەدا، بەڵکو ئەوان دەیانەوێ دەسەڵاتیان بەسەر زۆربەی هەرە زۆری شوێنەکانی پارێزگاکەدا هەبێ. ئەوان کار بۆ ئەوە دەکەن کە ئەو دابەشکردنە ئیدارییەی رژێم کردوویەتی هەڵبوەشێننەوەو پارێزگاکە بگەرێننەوە سەر سنووری ئیدارییەی کەی پێش ساڵی (١٩٧٥)و بەمەش ژمارەی کورد لە پارێزگاکە زیاد بکەنەوە. ئەم جموجۆڵەو بە ئاشکرا لەو ناوچانەدا دیارە کە پارێزگاکانی هەولێرو سلێمانی لە کەرکوك جیادەکەنەوە. ئەم ناوچانە ئەرزی حەرام بوونو رژێمی پێشوو هەموو خەڵکە کوردەکەی لێ دەرکردبوونو بە تەواوەتی چۆڵ کرابوونو پێی دەوترا (هێڵی سەوز). ئێستا کوردەکان دەگەرێنەوەو خانوو گوندەکانیان لەوێ ئاوەدان دەکەنەوە. دانیشتووانە غەیرە کوردەکەو تەنانەت حکومەتی کاتی عێراقیش تەماشای ئەم جموجۆڵە دەکەنو پێیان وایە جوولە پێکردنێکی راستەقینەو توقێنەری هێڵی سەوزە بەرەو ناوەوەی کەرکوك[٢٠].

سەرباری ئەوانەش جەلال تالەبانی رابەری (سکرتێری گشتی) یەکێتی نیشتیمانی کوردستان (PUK) هەمیشە ئەو دووپات دەکاتەوە کە دەبێت دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان زۆر زیاتر لە کەرکوکیش تێپەرێت تا دەگاتە پارێزگای دیالە. مەڵبەندی یەکێتی نیشتیمانیش لە خانەقین بەوە تۆمەتبارە کە (پاکتاوی رەگەزیی پێچەوانە)ی پیادە کردووە وەختێ سەدان خێزانی شیعەی عەرەبی لە ساڵی (٢٠٠٣)دا دەرکردووە. ئەم رەفتارە یەکلایەنانە هاوسەنگی دیمۆگرافی تێکدەدەنو بارگرژییەکە توندوتیژتر دەکەنەوە.

*** هەڵوێستی بەهەرەشەی تورکیا:**

گۆرانکارییەکانی ناو کەرکوك زەنگی خەتەریان لە ناو تورکیا لێدا کە کوردێکی زۆری لێ دەژی. تەنانەت لە کاتی خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگی ئازادی عێراق، تورکیا بە شێوەیەکی گەورە لە ئەگەری جموجوڵی کورد نیگەران بوو، کە بەرەو کەرکوك ببزوێن، دواتر ئەم ئەگەرە بە هاوپەیمانێتی کوردو ئەمریکا یەکلابۆوە کە روودەدات، بۆیە پەرلەمانی تورکیا رازی نەبوو لە تورکیاوە هیچ ئاسانکارییەك بۆ ئەمریکا بکرێ کە بەرەی باکوور لە دژی سەدام بکاتەوە[٢١]. لەو کاتەوە ئیتر بە شێوەیەکی گشتی سیاسەتی تورکیا لە بارەی کەرکوكو باکووری عێراقو کوردەکانەوە تا رادەیەکی زۆر پەرچەکردارانەیەو کاردانەوەی زۆری پێوە دیارە[٢٢]. تورکیا خۆیشی دەزانێ کە ئەگەر کار لە کارترازا زۆر زەرەر دەکات.

**أ. بەرژەوەندی زیندوو و هێڵی سووری گۆراو:**

ئەو کاتەی لە پاشماوەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی دەوڵەتی تورکیا دروستکرا ناچارکرا واز لە هەموو داخوازییەکانی سەبارەت بە (ویلایەتی موسل) بهێنێتو هێزی زاڵی بەریتانیا کە دەیزانی چ سامانێکی سروشتی لەو ناوچەیەدا هەیە لکاندی بە دەوڵەتی نوێی عێراقەوە. بەم کارە هەر ئەوەی لێ نەکەوتەوە کە عێراق سامانێکی نەوتینەی دەستکەوت، بەڵکو گەلی کوردیش پارچە پارچەتر کرا کە پێشتر بە پێی پەیماننامەی سیڤەر (Severs) لە ساڵی (١٩٢٠)دا بەڵێنی ئەوەی پێ درابوو دەوڵەتی بۆ دروست بکرێ کە چی دوای سێ ساڵ بە پێی پەیماننامەی لۆزان لێی بێبەش کرا[٢٣].

ئەمرۆ (١٢) تا (١٥) ملیۆن کورد لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیاو نزیکەی (٥) ملیۆنیش لە باکووری عێراقدا دەژین کە سەرەرای ئەوەی ئومێدیشیان کەم بۆتەوە بەڵام هەر خەون بەوە دەبینن کە دەوڵەتی سەربەخۆیان هەبێت. بوونو رۆڵی دەوڵەتی عێراق لە باشووری تورکیاداو ئاواتە نەتەوەییەکانی کورد لەمبەرو ئەوبەری سنوورەکەی دوو بزوێنەرە ستراتیجییەکەی تورکیا بوون کە پاڵیان پێوەنا لە پەرەسەندنەکانی ساڵی (١٩٩١)و بە تایبەتیش لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٣)دا ئەو رێبازەی هەبێ. تورکیا سنووری بە ئەورووپاوەیەو دوا تخوبی هاوپەیمانێتی باکووری ئەتڵەسییەو چەند دەیەیەکە چاوی بریوەتە رۆژئاواو خەون بەوە دەبینێ کە بە تەواوەتی تێکەڵی دامەزراوەکانی رۆژئاوا بێت، بۆیە حەزی نەکردووە خۆی بگلێنێتە کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراست، بەڵام هەوڵیشی داوە کە بازرگانیو سەرمایە گوزارییەکانیشی بەو لایەدا فراوان بکات. سەرنج دەدەین کە شەری (عێراق - ئێران) لە ساڵانی (١٩٨٠ - ١٩٨٨) بەرپا بوو، تورکیا زۆر بە وریاییەوە چاودێری دەکرد، بەڵام بێلایەنانە مایەوە[٢٤].

ئەنقەرە وای دەبینێ کە هێزی عێراقو یەکێتی خاکەکەی لەو مەترسییانەی کەم کردۆتەوە کە دەشێ لە رێی گەمەکەرە هەرێمایەتییەکانەوە تووشی ببێ، بە تایبەتیش لەلایەنی ئێرانو سعودییەوە. بەرپرسێکی گەورە لە وەزارەتی دەرەوەی تورکیا لە دیمانەیەکدا لەگەڵ (کرایسز گرووپ) رۆژی (٢٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤) ئەم مەسەلەیەی بەمجۆرە روون کردەوە کە: (هەمیشە عێراق لە ناوچەکەدا توخمی هاوسەنگی بووەو دەوڵەتەکانی دیکەی ناچار کردووە کە لە حاڵەتی دیفاعدا بن، هەر چەندە ئەڵتەرناتیڤێکیش بۆ خۆی لە ناوچەکەدا نابینێتەوە، بەڵام نیگەرانی هەرە گەورەی تورکیا لەوەیە کە عێراق لەبەر یەك هەڵوەشێ یان نەمێنێو ئەمیش ئامادە نییە ئەو هاوسەنگییە رابگرێ).

تورکیا سیناریۆیەکی بە مۆتەکەی لە خەیاڵدایە سەبارەت بە عێراق، ئەویش ئەوەیە کە شەرێکی ناوخۆیی لە عێراقدا بەرپا دەبێتو کورد لە باکوور دەوڵەتێك بۆ خۆیان پێکدەهێنن. یان شتێکی دیکەی لەو جۆرە روودەدات، ئەوسا کوردەکان بۆ ئەوەی ناوچەکەی خۆیان بپارێزن لە

ناوەندی رووخاو جیا دەبنەوە، ئینجا بە بیانووی مێژوویی و پێویستی ئابووری کەرکوکیش بە ناوچەکەیانەوە دەلکێنن و کوردستانی سەربەخۆ پێکدەهێنن. جا ئەگەر بەناویش ناوی دەوڵەتی کوردستانی نەبێ، بەڵام لە راستیدا وا دەبێت. وەلێ کوردەکان یەکگرتوو نین و ئەنقەرە پێیوایە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشیمانی کوردستان لەسەر حوکمرانێتی ئەم قەوارە نوێیە دەبێتە شەریان و ئیتر لەوێش ئاژاوە بەرپا دەبێت. لەمەش زیاتر ئەنقەرە لەو بروایەدایە کە دروستبوونی دەوڵەتی کوردی با شلۆق و نا جێگیریش بێت. هانی شیعەکانی باشوور دەدات، کە گەورەترین یەدەگی نەوتی عێراق لە ژێر خاکەکەیاندایە، ئەوانیش سەربەخۆیی خۆیان راگەیەنن. ئەمەش دێوەزمەی ئازادبوونی شیعە زیندوو دەکاتەوە کە لە هەشتاکانی سەدەی بیستدا بارگرژی زۆری لە ناوچەکەدا دروستکردو هەر بەو هۆیەشەوە عەرەب هاوکاری گەورەو زۆری عێراقیان لە جەنگەکەیدا لەگەڵ ئێران کرد[٢٥].

چاودێرێکی تورکیش پێی وایە دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردی لە باکووری عێراقدا، کەرکوك چەقە ئابوورییەکەی بێت، دەبێتە هۆی: (دە ساڵ ئاژاوەو ناجێگیریی، چونکە سەرکەوتنی ئابوورییانەی قەوارەیەکی وا دەبێتە جێی بایەخی کوردەکانی تورکیا)[٢٦]. توێژەرێکی دیکە دەڵێ: (کاتێ کە بایەخی ئابووریی باکووری عێراق بۆ خۆی نەوت و بازرگانییەوە گەورە دەبێت و خۆشگوزەرانی بە شێوەیەکی زەق ناکۆك دەوەستێ لەگەڵ هەژاریی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا، ئەوا کوردەکانی تورکیا هەندێکیان لایەنگیریی لە مەسعود بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان دەکەن، لانی زۆر مەیلیان بەلای برا کوردەکانی عێراقیاندا دەچێت)[٢٧]. بە واتایەکی دیکە مەترسییەکە لەوەدایە کە سەرکەوتن کورد کلپە لە هەستی جیاخوازی کوردان لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا هەڵدەستێنێ)[٢٨].

بەم هۆیانەوە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی کە کەرکوکیش یەکێك بێت لە پێکهاتەکانی هێڵی سوورە بەلای تورکیاوە[٢٩]. تا ئێستاش روون نییە کە ئایا دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ بە بێ کەرکوکیش (واتە لەسەر ئەو خاکەی کە حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ساڵی (١٩٩٢)ەوە بەرێوەی دەبات) هەر جێی رەزامەندی نییە؟[٣٠].

هێڵە سوورەکانی تورکیا هەرگیز جێگیر نەبوون و زوو زوو گۆڕان بە تایبەتیش کە ئەم وڵاتە هەوڵ دەدات ئەندامێتی یەکێتی ئەوروپای دەست بکەوێ، پێشتر تەنانەت فیدراڵییەتیش بۆ تورکیا هێڵی سوور بوو کە چی پاش ئاڵوگۆڕەکانی دوای جەنگ، کە تورکیا خۆیشی زانی دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نییە کار لە پەرەسەندنەکانی ئەو دیو سنوور بکات، زۆر بێدەنگانە ئەو هێڵی سوورە هەڵگیرا.

بەرپرسێکی گەورە دەڵێت: (راستە ئێستا حکومەتی تورکیا بە رێگەچارەی فیدراڵی رازییە. هێڵە سوورەکانمان کەمێك زیادە رۆیی تێدا بوو. سەر لیستی ئەرکەکانی ئەمرۆمان پاراستنی یەکێتی خاکی عێراقە ئەمەش بە دیدی ئێمە مانای وایە بە فیدراڵییەت رازین). لەمە زیاتر ووتی: (کە دەبێت کەرکوك بارێکی تایبەت و ئیدارەیەکی جیاوازی هەبێت تەرتیباتی دەستووری بۆ کرابێت و لە ریفراندۆمێکی گشتیدا پەسەند بکرێ)[٣١]. دیبلۆماتکارێکی رۆژئاوایی لەبارەیەوە هاوهەڵوێستەو دەڵێ: (حکومەتی تورکیا وای لێهاتووە کە بە بیرۆکەی قەوارەیەکی کورد لە باکووری عێراق رازی بێت، بەڵام ناتوانێت بەوە رازی بێت کە دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی هەبێ زاڵ بێت بەسەر سەرچاوەکانی وزەدا، واتە کەرکوکی تێدا بێت، دەوڵەتێکی لەو جۆرە مەترسییەکی کوشندەیە بۆ ئاسایشی دەوڵەتی تورکیا)، ئینجا ئەو دیبلۆماتکارە رۆژئاواییە بە (کرایسز گرووپ)ی ووت: (لەوانەیە ئەم تێروانینە زیادەرۆیی تێدا بێت، بەڵام جەنەراڵە تورکەکان بەمجۆرەی دەبینن)[٣٢].

هەر لەم رێچکەیەدا بوو کە تورکیا پێی وابوو لێدوانەکەی بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان لە تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤)دا کە ووتی: (کوردەکان بۆ مافەکانیان لە کەرکوك دەجەنگن) بە شێوەیەکی زۆر تایبەت ئیستیفزازی بوو. هەروەها بەو جۆرە لێکدرایەوە کە راگەیاندنی نیازی شەرکردنە لەپێناوی کەرکوك و هەنگاوێکە بۆنی ئەوەی لێ دەکرێ کورد هەوڵی سەربەخۆیی بدات[٣٣]. هەر چەندە هەندێ بایەخی ئەم لێدوانەی (بارزانی)یان کەم کردەوە بەو مانایەی کە هەڵوێستەگەلێکە لە چوارچێوەی پێویستییەکانی هەڵبژاردندا، کە چی قسەیەکی واش بڵاوبۆوە کە پێدەچێ نیشانەی زاڵبوونی سەربازان بێت بەسەر سیاسەتدا لە تورکیا، گوایە هێزێکی تورکیا کە لە (٢٠) هەزار سەرباز پێکهاتووە لەسەر سنوورن و ئامادەن بۆ جەنگ ئەگەر بارزانی قسەکانی خۆی جێبەجێ کرد[٣٤].

**ب. گەمەکردن بە کارتی تورکمان:**

کاریگەریی تورکیا لە رووبەرووبوونەوەی ئەگەرەکانی پەرەسەندنی بارودۆخی عێراق، بە تایبەتیش بە هەرەشەی لەشکرکێشی، زۆر سنووردارە، بەڵام بۆ نموونە، دەتوانێ مەرزی خاپوور دابخات و ئابووری کورد بخنکێنێ. کارێکی لەمجۆرە زۆر زیاتر کاریگەر ئەبێت ئەگەر سوریا و ئێرانیش وەك تورکیا بکەن، هەروەها دەتوانێت ئەو بۆرییە نەوتە دابخات کە باکووری عێراق بە دەریای سپی ناوەراستەوە دەبەستێتەوە[٣٥].

بۆ پتەوکردن و فراوانکردنی تواناکانی مانۆری خۆی، تورکیا پەرەی بە پەیوەندییەکانی داوە لەگەڵ تورکمانەکانی عێراق. ئەم جالییەیە بە رەچەڵەك جیاوازن لە نەتەوەی تورك، بەڵام زۆر بە توندی گوزارشت لە هەستی نەتەوایەتی لایەنگیری تورکیا دەکەن[٣٦].

هەر چەندە ژمارەی راستەقینەی ئەم کۆمەڵە ئەتنییە نەزانراوە، بەڵام بە دووەمین کەمایەتی دێت لە پاش کورد[٣٧]. یەکێك لە چاودێران دەڵێ: (لە تورکیا، کەرکوك هەمیشە وەك شارێکی تورکمانی ناسراوە و کورد لە گوندەکانەوە وەك غەوارەو بیانی هاتوونەتە شارەکەوە)[٣٨].

لە ماوەی ساڵانی سەدەی بیستدا، کوردەکان لەو شارانەدا جێگیر بوون کە پشت بە ئابووری پترۆڵ دەبەستن. بەو هۆیەوە

نیگەرانیو دڵەڕاوكێی توركمانەكان زیاتر بوو، بەڵام لە لووتبەرزیشەوە تەماشای كوردیان دەكرد. ڕۆژنامەنووسێكی تورك ئەم حاڵەتی خۆبەزلزانینە چینایەتییەی توركمانەكان لە دژی كوردەكان بەوە تەفسیر دەكات كە توركمانەكان لە سەردەمی عوسمانیدا ئەسیادو گەورە ئەفسەرو بازرگانو پیشەوەر بوون كە چی زۆربەی هەرە زۆری كوردەكان جووتیارو سەپانو سەربازی پیادە بوون[٣٩]. پیرەمێردێكی توركمانیش دەڵێ: (وەكو ئەفریقاییەكان لە ئەمریكا، كوردەكان لە عێراق خزمەتكارو بەردەست بوون. ووردە ووردە لەم شارانە نیشتەجێ بوون. كە حكومەتی عێراقیش گوندەكانیانی بۆردومان كرد، بە ژمارەی زیاتر كۆچیان بۆ ناو شارەكان كرد[٤٠]. لە هەنگاوێكیشدا كە بەهەنگاوێكی ئازاربەخشی دەزانین حكومەتی ئینتیداب زمانی خوێندنی لە توركییەوە كرد بە كوردی، زمانی خزمەتكاران)[٤١].

بە ڕای چەندین چاودێر توركیا توركمانی وەك بەهانە بەكارهێناوە بۆ دەستێوەردان لە عێراقدا تا بەرژەوەندییە زیندووەكانی لە باكوور بپارێزێ. لەمەدا ئیشی لەسەر ئەو تووڕەبوونو دڵەڕاوكێیە كردووە كە لای توركمانەكان بەرامبەر لێشاوی كوردە گەڕاوەكان دروست بووەو بەكاری هێناوە بۆ ووروژاندنی ئەو هەستو سۆزە لایەنگیرەی لە ناو توركیا هەیە بۆ لەشكركێشی.

ڕۆژنامەنووسێكی تورك دەڵێ: (توركیا تەنیا دە ساڵ دەبێت بایەخ بە مەسەلەی توركمان دەدات بە تایبەتی كە شەڕی ناوخۆ لە كوردستان بەرپا بوو)، هەروەها دەڵێ: (ئەو كاتە مەسەلەی توركمان بەلای هێزی ڕاستڕەوی توركیاوە ڕەهەندێكی ئایدیۆلۆجی وەرگرت)[٤٢]. بە گوتەی دیبلۆماتێكی ڕۆژئاواییش بێت: (ئەمە مانای وانییە كە بایەخدانی توركیا بە توركمان هەڵبەستراو بێت، بەڵكو ئیستیغلال كرا، توركەكان بە درێژایی حوكمڕانێتی سەدامو دەورانی تەعریب دەرهەق بە توركمانەكان بێدەنگ بوونو دەستپێشخەرییەكیان نەكردووەو بۆ هەنگاوێكی تایبەت لەو بارەیەوە، كە چی ئەمڕۆ دەزانن مەسەلەكە لەلای جەماوەری توركی جێ دەكاتەوە كەوتوونەتە جووڵە، هەر لە ڕاستیشدا فشارێكی ڕاستەقینەش هەیە).

بەرەی توركمانی عێراقی ئەو ئامرازە سەرەكییەیە كە توركیا بەكاری هێنا بۆ كردنەوەی دۆسێی توركمانەكان. بەرە ڕێكخراوێكی دەزگاكانی ئاسایشی توركیا بە پارەو پولی حكومەتی توركیا لە ناوەڕاستی نەوەدەكانی سەدەی بیستدا دروستیان كرد)[٤٣].

بەرەی توركمانی هەر هەوڵی ئەوەی داوە كە توركمانەكان لە ژێر یەك چەتردا كۆبكاتەوە بەو ڕێیە كە گوزارشت لە دڵەڕاوكەی ئەوان بكاتو داوا لە توركیا بكەن دەخاڵەت بكات. ئەندامێكی سەركردایەتی (بەرە)ش ووتی: (دەمانەوێ هێزەكانی توركیا بێنە كەركوكەوە، چونكە كوردەكان ناكشێنەوە. چۆن دەكرێ بەوە ڕازی بین كە ئەوەی هی ئێمە بوو لێمان زەوت بكەن؟ كوردەكان هەرگیزاو هەرگیز خۆبەخۆ لە كەركوك ناكشێنەوە، بەڵام كە توركیا هات هەڵدێن)[٤٤].

چونكە بەرە بە دەستی دەرەكی دروست كراوە تەنانەت لە ناو خودی توركمانەكانی عێراقیشدا ڕۆڵی ئەو لە باكووردا مایەی مشتومڕ بوو[٤٥]، بەڵام لە ناو توركیادا بە پێچەوانەوە واپێدەچێ جەماوەر ئاگای لەوە نەبێت كە حكومەتەكەیان ڕۆڵی هەیە لە ئاژاوەنانەوە لە باكووری عێراق دا یان ئەم جەماوەرە هەر لە بناغەوە بایەخ بەم مەسەلەیە نادەن[٤٦].

جالییەی توركمان دەزانن ڕای باو ئەوەیە كە ڕیشەی بەرە ڕیشەیەكی بیانییەو ئەم سیفەتە بەسەر هەموو توركمانیشدا شكاوەتەوە، بۆیە توركمانێكی هەڵسوڕاوی سەربەخۆ دەڵێت: (ئێمە پێویستمان بە توركیایە كە بمانپارێزێ، بەڵام كە ئێمە ببینە لقێكی حكومەتی توركیا ئیتر ڕاستگۆییمان نامێنێ)، تەحسین كەهیە ئەندامی یەكگرتووی ئیسلامی توركمان نیگەرانی خۆی لەو ڕیعایەت كردنەی توركیا بۆ بەرەی توركمانی دەربڕی كە دەشێ لەشكركێشی لێ بكەوێتەوەو ووتی: (من دژی دەستێوەردانی سەربازیی توركیام، ئێمە عێراقینو دەبێت كێشەكانمان خۆمان چارەسەریان بكەین، ئەگەر هێزەكانی توركیا هاتنە عێراقەوە سوریاو ئێرانیش وا دەكەن، ئێمە تەنیا پێویستمان بە هاریكاری توركیایەو هیچی دیكە نا).

**ج. مشتومڕ لە بارەی لەشكركێشییەوە:**

بە شێوەیەكی گشتی لە توركیا وا تەماشای لەشكركێشی توركیا دەكەن بۆ ناو عێراق وەك پرۆژە وەڵامێك بۆ دەستبەسەرداگرتنی پێشبینیكراو یان ڕاستەقینەی كوردەكان بەسەر كەركوكدا. هەمووش لەسەر ئەوە كۆكن ئەم زاڵبوونە هەڕەشە لە مافەكانی توركمان دەكات. لە ڕاستیدا هەڵبەستنی (مەسەلە)ی توركمان خۆی لە خۆیدا لەشكركێشی توركیا خێراتر دەكات.

دیبلۆماتێكی ڕۆژئاوایی لە ئەنقەرە بە (كرایسز گرووپ)ی ووت: (١٥٠٠ تا ٣٠٠٠ سەربازی هێزی تایبەتی توركیا لە باكووری عێراقدان، بەڵام لە بارەی ئەركو چالاكییەكانیانەوە زانیاری زۆر كەمە. ئەم هێزە لە نزیك سنوورەو لە ئاداری ساڵی (٢٠٠٣)وە بە بیانووی ئەوەوە هاتووە كە ڕێ لەو كوردانە بگرێ كە لەوانەیە وەكو ساڵی (١٩٩١) بە هۆی جەنگەوە كۆچرەو بكەن بەرەو توركیا. بەڵام هەندێك ڕاپۆرت ئاماژە بەوە دەكەن كە بەشێك لەم هێزە لە نزیك موسڵو كەركوكو تەلەعفەرەوەو ئەگەر پێویستی كرد زۆرتریش دەكرێ).

وەك چاوەڕوانكراو بوو، بە بوونی ئەم هێزە هەستی كوردەكان كلپەی سەند. ئەوە بوو لە تەموزی ساڵی (٢٠٠٣) دا ڕووداوێكی ڕوویدا شەرمەزارییەكی زۆری بۆ توركیا دروست كرد، پۆلیسی كورد لە سلێمانی ژمارەیەك چەكداری دەستگیر كرد، چونكە گومانی لێ كردبوون كە خۆیان ئامادەكردووە بۆ تیرۆركردنی پارێزگاری كەركوك دوایی دەركەوت هەموویان سەربازی هێزی تایبەتی توركیان. پاش ئەم گورزە ئینجا حكومەتی توركیا سەبارەت بەو سیاسەتەی لە باكووری عێراقدا پیادە دەكرێ، هەندێ دەسەڵاتی لە سوپا سەندەوە. بەڵام لەو بوونی سەربازییەی توركیا لە باكووری عێراقدا هەروەكو خۆی مایەوە.

جارێکی دیکە لە تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٣)دا تروسکایی دەرفەتێکی دیکە دەرکەوت، بە تایبەتیش کە باری ئەمنی عێراق تێکچوو و ئەمریکاش هەوڵ دەدا دەوڵەتانی دراوسێ سەربازی خۆیان بنێرن بۆ هاریکاریکردنی لە سەقامگیریی وەزعەکەدا، ئەوە بوو پەرلەمان پێشنیارەکەی حکومەتی قبوڵ کرد کە (١٠) هەزار سەرباز رەوانەی عێراق بکات، بەڵام ئەم پێشنیارە سەرکردە کوردەکانی زۆر تووڕە کرد. هۆشیار زێباری وەزیری دەرەوەی عێراق و هەندێ لە ئەندامانی ئەنجومەنی حکومەتیش تورکیایان بەوە تاوانبار کرد کە پیلانی دارێژراوی لە کۆنەوەی هەیە بۆ داگیرکردنی بیرەنەوتەکانی موسڵ و کەرکوك.

لە کاتی رووداوەکانی تەلەعفەردا لە ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٤)دا خەڵکی سڤیل کوژراون و ئاوارەبوون، ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانی ئەمریکا هەوڵیان دەدا کارو کردارەکانی یاخیبووان راگرن، کە چی سەرەرای ئەو هەڵایەی لە ناو تورکیادا بەرز ببووەوە کە گوایە لە تەلەعفەر (پاکتاوی رەگەزیی) لە دژی تورکمانەکان بەرپایە، هێزەکانی تورکیا کە لەو ناوچەیە بوون بێلایەنانە مانەوە.

ئەم ئەزموونانە بەڵگەی ئەوەن کە باجی سیاسیبوونی هێزە تایبەتەکانی تورکیا لە باکووری عێراق کە گوایە نێردراون بۆ پاراستنی تورکمانەکان و لە راستیشدا ئامانجەکەی ئەوەیە رێ نەدەن دەوڵەتی کوردی دروست ببێ، باجێکی زۆرەو ئەم هێزانە رووبەرووی مقاوەمەتێکی جەسورانەی جەنگاوەرە کوردەکان دەبنەوە کە لە شەرە جۆراوجۆرەکاندا شارەزاییەکی زۆریان کۆکردۆتەوە. هەروەها لەبەر رۆشنایی چاکبوونی پەیوەندی تورکیا لەگەڵ یەکێتی ئەورووپا ئەو گۆرانکارییە گرنگانەی سەبارەت بە پێگەی نێودەوڵەتی تورکیا روویانداوە وا پێدەچێ هاندەر نەبن، کە تورکیا خۆی لە کردەوەیەکی لەوە فراوانتری سەربازی بگلێنێ.

دیبلۆماتێك لەمبارەیەوە ووتی: (مەیلی سەرکێشی تورکیا بۆتە پاشماوەیەکی رابردوو، تورکیا ئێستا دەزانێ کە لێی خۆش نابن. هەموو هەرەشەکانی دەستوەردان لە باکووری عێراقیش سەلمێنراوە کە پرووپووچن و ئێستا چاودێرییەکی مەدەنی زۆر زیاتر لەوەی رابردوو بەسەر رەفتارەکانی سوپاوەیەو سوپاش خەریکە متمانەی سیاسی پەیدا دەکاتەوە. سوپا بیروڕای تایبەتی خۆی هەیە سەبارەت بە عێراق، بەڵام سیاسەتێکی تایبەتی نییە).

هاوکات کۆبوونەوەیەکی چاودێران و توێژەروان لە ئەستەمبوڵ ئەوەی دووپات کردەوە کە: (دوای راستەوەکان کە تورکیا لەشکرکێشی بکات، دیدوبۆچوونی سوپا عەکس ناکاتەوە. هەر چەندە تورکیا بەردەوام لە هەموو بۆنەیەکدا باسی لەشکرکێشی دەکات، بەڵام هەر خۆشی باش دەزانێ کە لەسەر ئەرز باجەکەی یەکجار گەورە دەبێت، واتە قوبرسێکی دیکەی تووش دەبێت)[47].

بەڵام هەمووان هەست بەم متمانەیە ناکەن و لێدوانەکانی حکومەت مەزەندەی بەیەکتر ناکۆك و هەندێ دڵەراوکێش دروست دەکەن.

کردەوەی توندرەو تەنانەت کە لە رووکەشیشدا وا دیار بن کە ناعەقڵانین، بەڵام لەوانەیە هەر کاردانەوەی توندرەو دروست بکات و زیانیش بە بەرژەوەندییە دوورخایەنەکانی تورکیا بگەیەنن. حکومەتیش وەك یەکێك لە توێژەروان ئاماژەی پێکرد، هەموو شتێك دەکات بۆ پاراستنی تورکمانەکان لە کەرکوك، ئەگەر کوردەکان جووڵان بۆ داگیرکردنی شارەکە. ئامادەشە: (بە تەواوەتی دەرەنجامەکانی ئەم کردەوەیەی لە ئەستۆ بگرێ وەك چۆن لە قوبرس کردوویەتی)، دیبلۆماتێکی رۆژئاوایش لەم بارەیەوە ووتی: (زیان بە خۆگەیاندنی مەسەلەیەکە تورکەکان زۆر شارەزان تێیدا).

**د. رەهەندی نێودەوڵەتیی:**

تورکیا لە ناو خودی خۆیدا سەبارەت بەوەی لە باکووری عێراق چی بکات دابەشە بەسەر چەند تەوژمێکدا، هەڵوێستی ئەمریکاش کە تەنیا هێزێکە دەتوانێ هاوکار بێت بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەیەکی ئاشتییانە بۆ کەرکوك بە هەڵوێستێکی نیگەتیڤ و رقهەڵسێن دەبینێت. بەلای تورکیاوە سیاسەتی ئەمریکا لە باکووری عێراقدا نەبوونی سیاسەتە، چونکە لەلایەکەوە زۆر سەقاڵی قەیرانی ئەوەدوای عێراق[48]، لە لایەکی دیکەشەوە قەرزاری کوردەکانە کە لە کاتی جەنگدا زۆریان هاریکاری کرد، هەروەها دوودڵە لەوەی پێش بە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بگرێ چونکە دوو حیزبن ئایدیۆلۆجییەتی عەلمانیان هەیەو باشترین دوو خەیارن بۆ لە پەراوێزکردنی رەوتی ئیسلامی لە ناو کورداندا. هاوکات سیاسەتێکی چالاکی پیادە نەکردووە بۆ سووککردنەی ئەو بارگرژییەی لە کەرکوکدا هەیە (دوای دامەزراندنی ئەنجومەنی حوکم لە ساڵی (٢٠٠٣)دا). هەر چەندە ئەمریکا (٥٠) ملیۆن دۆلاری بۆ کوردە راگوێزراوەکانی کەرکوك تەرخان کردووە، بەڵام پێویستی بە نەخشەیەك سەرتاسەری هەیەو لە حاڵی حازردا شتێکی ئەوتۆ دیار نییە کە ئەمریکا بۆ کەرکوك ئیشێکی جدی بکات[49].

باردودۆخەکە بەوجۆرە کە دیبلۆماتێکی رۆژئاوایی بە چڕکراوەیی باسی دەکات بریتییە لەوەی کە: (تورکیا لەوە دەترسێ ئەمریکا لە کێشەی کەرکوك بە ئاگا نەیەت تا ئەو کاتەی کار لە کار دەترازێ).

پرۆسەکەی تەلەعفەر ئاساوارێکی نیگەتیڤی لەسەر پەیوەندی نێوان تورکیا و ئەمریکا جێهێشتووە، ئەو کاتەی وڵاتە یەکگرتووەکان هێرشێکی ئاسمانی و پیادەیی لە (٩)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٤)دا بەرپخست بۆ ریشەکێشکردنی یاخیبووەکان وەزیری دەرەوەی تورکیا عەبدوڵڵا گول ئەوەی مەحکوم کرد کە ناوی نابوو: (بەکارهێنانی زیادەرۆیی هێز دژی مەدەنییەکان)و هەرەشەی ئەوەیشی کرد کە ئەگەر پرۆسەکە بەردەوام بێت (حکومەتی تورکیا لە هەموو بوارەکاندا شەراکەتی خۆی لەگەڵ ئەمریکا لە ناو عێراقدا کۆتایی پێدەهێنێت)[50].

هەمان دیبلۆماتی رۆژئاوایی دەڵێ: (حکومەتی تورکیا تێناگات بۆچی ئەمریکا کە زۆر باسی جەنگ لە دژی تیرۆر

دەكات، لە دژی پارتی كرێكارانی كوردستان (PKK) كە لە حوزەیرانەوە (١٥٠٠) جەنگاوەی لە سنوور پەڕیونەتەوە، هیچی نەكردووەو نایكات)[٥١].

توركیا پشتی بە ئەمریكا بەستبوو كە بەڵێنەكانی بكاتە كردارو سەربازەكانی بنێرێت بۆ تێكشكاندنی پارتی كرێكارانی كوردستان وەك ئەوەی كە جەنگاوەرەكانی ئەنساروئیسلامی لە ئاداری ساڵی (٢٠٠٣)دا ڕیشەكێش كرد. بەر لەسەردانەكەیشی بۆ توركیا سەرۆك بۆش بەڵێنیدا یارمەتی حكومەتی توركیاو عێراق بدات بۆ لەناوبردنی ئەو ڕێكخراوەو ووتی: (پێكەوە كاردەكەین بۆ لەناوبردنی پارتی كرێكارانی كوردستان. ئێمە راوەدووی تیرۆریستان دەكەین‌و كە ڕێكخراوێكیشمان ناو نا تیرۆریست ئەوە ئێمە دەزانین چیمان ووتووە[٥٢]، كە چی ئەمریكا بەڵێنەكەی بەدی نەهێنا).

لە دوور مەودادا سەركردایەتی توركیا زۆر پشت بەوە دەبەستێ كە ئەندامێتی توركیا لە یەكێتی ئەوروپادا چارەسەرێكی بۆ كێشەی كورد بۆ دەدۆزێتەوە لە توركیاو لە باكووری عێراقیش.

هەر چەندە ئەمریكا ڕۆڵی لەوەدا هەبوو كە لە (١٧)ی كانوونی یەكەمی ساڵی (٢٠٠٤)دا یەكێتی ئەوروپا دەنگیدا دانوستانی وەرگرتنی توركیا دەست پێ بكرێ[٥٣]، بەڵام خشتەیەكی زەمەنی بۆ ئەو دانوستانە دانەنراوەو دەرەنجامی دڵنیایەكەرەوەشی دیار نییە، بەڵام سەرچاوەیەكی سەرەكییە بۆ دڵنیایی دەروونیی توركیاو پێی وایە كوردە هەژارو تورەكان ڕوو لە ئەوروپا دەكەن بۆ ئیش‌و سەرمایەگوزاریی‌و لە داوێ جیاخوازیی دوور دەكەونەوە كە دیاردەكانی پێشكەوتنی خزمەكانیان لەو دیو سنووری باشوورییانەوە لە عێراق دایدەنێنەوە[٥٤].

*** گەڕان بە دوای دەرچەیەكدا:**

لە ڕووبەڕووبوونەوەی هێزگەلێكدا كە توركیا ناتوانێ كۆنترۆڵیان بكات، ئەمرۆ ستراتیژییەتی خۆی بە جۆرێك ئاراستە كردووە بەرەو قەیرانی عێراق كە پابەندو گونجاو بێت لەگەڵ ئەو سەركەوتنانەدا كە لە بەغدا بەدەست دەهێنرێن[٥٥]، بەو چارەسەرەشەوە بۆ كەركوك، كە بنەماكەی دانوستانە لەنێوان هەموو لایەنەكانی عێراقدا. سەرەڕای ئەوەش توركیا موجازەفە دەكات كە بۆ یەكجاری واز لەوە بهێنێت دەخالەتی سەربازی بكات لە حاڵەتێكدا پەرەسەندنێكی هەڵە لە عێراقدا ڕوویدا یان عێراق دابەش كرا یان كوردەكان دەستیان بەسەر كەركوكدا گرت وەك هەنگاوی یەكەم بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان (سەرنج دەدەین كە كرایسز گرووپ لەسەر ئەو ڕایەیە كە نابێت بۆ یەكجارەكی توركیا واز لە خیاری لەشكركێشی بهێنێت بە تایبەتی ئەگەر كورد ویستی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی دامەزرێنێ. كرایسز گرووپ پێی وایە ئەگەر توركیا واز لە خەیاری لەشكركێشی بهێنێت موجازەفە دەكات).

لەلانی كەمیدا ئەزموونی عێراق لە دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدامەوە ئەوەندەی دەشێ بە ڕێی ڕاستیدا بڕوات ئەوەندەش دەشێ كە بە ڕێی چەوتا بڕوات. لەم حاڵەتەدا كرایسز گرووپ پێی وایە: توركیا پێویستی بە ئارامی هەیە لە كوردستانی عێراقدا (جا ئایندەی ئەم كوردستانە هەر چۆنێ بێت). تەنیا ڕێیەكیش بۆ ئاسانكردنی ئەمە ئەوەیە كە لەگەڵ سەركردایەتی كوردی عێراقدا كار بكەن بۆ برەو دان بە بازرگانی‌و گەیاندنی پارە بۆ كاروباری سەرمایەگوزاری لە كوردستانی عێراقدا. دەكرێ ئەم كارە بەو جۆرە بكرێ ئەگەر بەرژەوەندییە هاوبەشەكان لە بەرچاو بگیرێ: توركیا بۆ ڕێگرتن لە ئاژاوە پێویستی بە پەیوەندی باشە لەگەڵ كوردەكان، وەلێ قەوارەی ئابلۆقەدراوو لاوازی كوردیش هیچ ئەلتەرناتیفێكی دیكەی نییە جگە لەوەی پشت بە توركیا ببەستێ بۆ ئەوەی بیپارێزێ. هەڵبەت لەنێوانی باكوورێكی پڕ ئاشووب‌و ئاژاوەو باكوورێكی ئارامدا كە حیزبە كوردییەكان بەڕێوەی ببەن (تەنانەت ئەگەر سەربەخۆش بێت)، هەر وەكو چاودێرێكی تورك پێشبینی دەكات، توركیا باكوورە ئارامەكە هەڵدەبژێرێ[٥٦].

هەندێ لە خاوەن سەرمایەكانی توركیا لەو بڕوایەدان سەرمایەگوزاری لە باكووری عێراق شیاوە، چونكە نەوت ئەو توانایە دەبەخشێ بە كوردەكانی عێراق بە پێچەوانەی كوردەكانی توركیاوە كە قەرزەكانیان بدەنەوە.

پەیوەندی تورك – كورد لە بواری ئابووریدا لە ماوەی یەك ساڵی ڕابردوودا باش بووە، لە تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٣)دا توركیاو عێراق پرۆتۆكۆڵی هاریكارییان لە بواری كارەبادا مۆركرد، لە ئابی ساڵی (٢٠٠٤)دا هەردوولا گفتوگۆیان لە بارەی دابەشكردنی ئاو و كردنەوەی مەرزێكی دیكە كرد، لە دوای جەنگیشەوە یەكەمین قەواڵەی ناردنە دەرەوەی نەوتی خاوی كەركوكیان مۆركرد. زیاتر لە (١٠٠٠) كۆمپانیای توركی لە عێراقدا كار دەكەن بە شێوەیەكی تایبەتی لە بواری بیناو گواستنەوەدا كە تریلە توركییەكان بە هەزاران تۆن شمەك بۆ سوپای ئەمریكا دەگوازنەوە. هەن وای دەخەمڵێنن كە بڕی ئەم ئاڵوگۆڕە بازرگانییەی نێوان عێراق‌و توركیا لە ساڵی (٢٠٠٤)دا گەیشتۆتە (٢) ملیۆن دۆلارو تا ساڵی (٢٠٠٥) دەگاتە (٥) ملیۆن. لەگەڵ نزیكبوونەوەی تەواوبوونی فرۆكەخانەی نوێ‌و تاوەری چاودێری لە هەولێر، پارتی دیموكراتی كوردستان‌و توركیا كەوتوونەتە گفتوگۆ لە بارەی گەشتی ئاسمانی لەنێوانی ئەستەمبوڵ‌و باكووری عێراقدا. پەیوەندی توركیاش لەگەڵ دوو سەركردەكەی كورددا، مەسعود بارزانی‌و جەلال تاڵەبانی، ئەگەرچی گەرمیش نییەو سەرەڕای لێدوان‌و دیدگا بە یەكتر ناكۆكەكان، بەڵام كاركردنی جدی‌و هەندێ جار لوتفی پێوە دیارە[٥٧].

لەپێناوی باشتربوونێكی چلۆنایەتی پەیوەندی نێوانیان، دەبێت هەردوولا هەنگاو بنێن بۆ گۆڕینی ڕەوشەكەو دانانی میكانزم گەلێك كە ڕێگرن لە سەرهەڵدانی ناكۆكی نوێ.

بەر لە هەر شتێ دەبێت هەردوولا لێدوانە حەماسییەكانیان ڕاگرن. ئینجا توركیا هاوكاری كردنی دارایی بەرەی توركمانی ڕاگرێ كە بە هۆیەوە بەكارهێنانی مەسەلەی توركمان وەك بەهانایەك بۆ لەشكركێشی كەم دەكاتەوەو دەرەنجام دەرفەتەكانی دەخالەتی كردنیش كەم دەكاتەوە.

سەرکردایەتی کوردیش دەبێت لە مەسەلەی کەرکوکدا دان بە خۆدا بگرێ و گەلەکەی بۆ چارەسەرێکی میانڕەو لە ئایندەدا بسازێنێ.

لەوانەیە دانانی چاودێرێکی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کەرکوک خزمەتی بەرژەوەندییەکانی هەردوولا بکات و کاربکات بۆ هێورکردنەوەی بارگرژییەکان لە ڕێی گوێگرتن لە هەردوولا و چاودێری کردنی کارەکانی حکومەتی عێراق بۆ ڕاستکردنەوەیە ئەو زوڵمەی لە ڕابردوودا کراوە و خانووبەرە و قوتابخانە و خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان بۆ گەراوەکان دابین بکات و گەشەی ئابووری و دروستکردنی دامەزراوەکان دوور لە تایەفەگەری بە تایبەتیش پۆلیس برەو پێ بدات.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو بڕیاردانەی لە کاتی پرۆسەی دەستووردا وەردەگیرێن دەکرێ بیر لە ڕۆڵێکی گەورەتری نەتەوە یەکگرتووەکان بکرێتەوە لە ڕێ دانانی چاودێرێکی خاوەن دەسەڵات کە بتوانێ یاسا بسەپێنێ و پۆلیسی فرەرەگەزو دادگای هەبێ و خزمەتگوزاری دیکەش بە هاوکاری و پارەی دەرەوە دابمەزرێنێ(٥٨).

دواجار کە تورکیا خۆی ئامادە دەکات بۆ دانوستانەکانی چوونە ناو یەکێتی ئەوروپاوە چاکتر وایە بیر لەو میکانیزمانە بکاتەوە کە فشارو پاڵەپەستۆیەکەی لە باشووری ڕۆژهەڵات کەم بکاتەوە ئەوەش لە ڕێی دەرکردنی لێبووردنێکی گشتی و بەرفراوان بۆ جەنگاوەرەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان کە شمولی سەرکردایەتییەکەیشی بکات و داوا لەوانە نەکات کە خۆیان دەدەن بەدەستەوە ئیعتراف لەسەر هاوڕێکانیان بکەن(٥٩).

بەرژەوەندی ئەمریکا کە هاوپەیمانی ستراتیجی تورکیایە و یەکێتی ئەوروپاش لەوەدایە کە هانی حکومەتی تورکیا بدەن کاری ئەوتۆ بکات لە باکووری عێراقدا دەرەنجامی پێچەوانەی ئەمانەی ئێستای بکەوێتەوە. هانی ئەوەی بدەن ڕۆڵێکی پۆزەتیڤ بگێڕێ لە بارودۆخێکدا کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر کڵپەدەسێنێ. دەبێت ئەو دووانە بە پەلە ئیش بکەن بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کەرکوک و پشتگیری پەیوەندی نێوان تورکیا و سەرکردایەتی کورد بکەن و هانی سەرمایەگوزاری بدەن لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا (بۆ ئەوەی کوردەکانی ئەوێ بە بەڵگە ببینن کە تورکیا دەچێتە ڕیزی یەکێتی ئەورووپاوە چەند، سوودی زۆرە)، بەمەش ئامەیەکی تۆکمە بۆ تورکیا دەنێرن کە ئەمان تەواو پابەند بەوەوە کە ڕێگەچارە بۆ داخوازییە ئەمنییە ڕەواکانی تورکیا بدۆزنەوە، ئەمەشیان لای خۆیەوە ئەو متمانەیە بە حکومەتی تورکیا دەبەخشێ کە پێویستی پێیەتی بۆ پەرەپێدانی پەیوەندییە سیاسی و ئابوورییە تۆکمەکان لەگەڵ سەرکردایەتی کورد لە باکووری عێراق، لە ڕێی ئەم پەیوەندییەشەوە تورکیا دەکەوێتە بارێکی چاکترەوە کە ڕۆڵێکی پۆزەتیڤ لە مەسەلەی کەرکوکدا بگێڕێ. هەر ئەمەیشە کە بەرژەوەندییەکانی تورکیا کاریگەرانەتر دەپارێزێ لە جیاتی هەرەشە و گورەشەی پڕوپووچی لەشکرکێشی کە جگە لە نائارامی هیچ بەرهەمێکی دیکەی نییە.

*** ڕاسپاردەکان:**

**أ. بۆ حکومەتی تورکیا:**

١. بەیاننامە حەماسەت خولقێنەکان لە بارەی کەرکوک و کورد و تورکمانەوە ڕاگرێ.
٢. هاوکاری دارایی بەرەی تورکمانی ڕاگرێ.
٣. پابەند بێت بە چارەسەری ئاشتییانەی مەسەلەی کەرکوکەوە و ڕێز لە هەر چارەسەرێک بگرێ کە عێراقییەکان خۆیان لەنێوان خۆیاندا لەسەری ڕێکدەکەون.
٤. مەرزەکان لەگەڵ عێراقدا بە کراوەیی بهێڵێتەوە و بەردەوام ئیش بە بۆرییەکانی نەوتی (کەرکوک - سیحان) بکات.
٥. هانی سەرمایەرگوزاری بدات لە باکووری عێراق و لەم کایەیەدا هەر چەندی دەکرێ ڕاستەوخۆ ئیش لەگەڵ سەرکردایەتی حیزبە کوردییەکاندا بکات.
٦. پرۆژەی لێبووردنێکی گشتی بەرفراوان بۆ ئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستان دیراسە بکات کە شمولی سەرکردایەتی ئەو حیزبەش بکات و گەراوەکان ناچار نەکات ئیعتیراف لەسەر هاوڕێکانیان بکەن.

**ب. بۆ سەرکردایەتی کورد لە عێراق:**

١. بەیاننامە حەماسەت خولقێنەکان لە بارەی کەرکوکەوە ڕاگرن.
٢. دەستبکەن بە ئامادەکردنی جەماوەری کورد بۆ چارەسەرێکی میانڕەوانەی تەوافقی بۆ ئامانجە نیشتمانییە کوردییەکان بە پلەیەکی پێشکەوتووی ئۆتۆنۆمییەوە لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقی لامەرکەزیداو شارو پارێزگای کەرکوکیش بارێکی تایبەتی هەبێ.
٣. واز لەو دام و دەزگایانە بهێنن کە حیزبە کوردییەکان پاش جەنگ لە کەرکوک دەستیان بەسەردا گرتووە و هاوکاری ئەوە بکەن، کە سەر لە نوێ دەسەڵات بە شێوەیەکی هاوسەنگ دابەشبکرێتەوە و ئەو ئەنجومەنە سەرکردایەتیان بکات کە لە ڕۆژی (٣٠)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥)دا هەڵدەبژێردرێت.
٤. پشتگیری سەرمایە گوزاری و بازرگانی کردن لەگەڵ دراوسێکاندا بکەن.

**ج. بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان و یەکێتی ئەوروپا:**

١. بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان حکومەتی تورکیا و سەرکردایەتی کوردی عێراق.
٢. هاندانی سەرمایەگوزاری لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا.
٣. پێشکەشکردنی داوانامەیەک بە ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی سەبارەت بە:
أ. دانای نوێنەرێکی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ چاودێریکردنی بارودۆخی کەرکوک (شەریکەو پارێزگاکەش)، بەو مەرجە کە هەر سێ مانگ جارێ ڕاپۆرتێک بدات بە ئەمینداری گشتی لە بارەی ئەو پەرەسەندن و ڕەفتارانەی هەرەشە لە باری ئارامی بارودۆخەکە دەکەن.
ب. دیراسەی ئەوە بکات کە بە ڕاوێژ لەگەڵ حکومەتی هەڵبژێردراوی عێراقیدا سەرپەرشتیارێک لە نەتەوە

یەکگرتووەکانەوە بۆ کەرکوک دابنرێ، ڕێگە پێدراو بێت کە یاسا بسەپێنێ و لە ڕەگەزە جۆراوجۆرەکان هێزی پۆلیس و دادگا و دامەزراوێ دیکە پێکەوە بنێت (سەرنج دەدەین کە ئەم پێشنیارە جۆرێکە لە ئینتیداب، بەڵام بەناوی سەرپەرشتیارەوە).

ج. هەوڵبدات پارەو پولی لە دەوڵەتانەوە دەستبکەوێ بۆ ئاسانکردنی کاری سەرپەرشتییەکە.

* سەرچاوە و پەراوێزەکان:-

١. بە پێی خەملاندنی پسپۆرانی نەوت بێت ئەوا بیرە نەوتەکانی کەرکوک کۆنترین بیری ناو عێراقن و بە زۆری دۆشراون، چ ڕژێمی پێشوو، چ حکومەتی کاتیی ئێستا جەختیان لەوە کردووە نەوتەکەی ئێرە بە زۆری دەربهێنرێت. ئەمەش وادەکات پرسیاری جددی لەو بارەیەوە بکرێ کە ئایا ئەگەر کار وا بروات کەرکوک دەتوانێ بە هەمان توانا بۆ ماوەیەکی درێژ نەوت بەرهەمبهێنێ؟

٢. لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٤)دا بەرهەمی ڕۆژانەی عێراق لە نەوتدا گەیشتە (٢,٨) ملیۆن بەرمیل، ئاژانسی (ڕۆیتەرز) یش لە ڕاپۆرتێکی خۆیدا ڕۆژی (١٧)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤) نووسیویەتی بە هۆی ئەو هێرشانەوە کە یاخیبووەکان کردوویانەتە سەر بیر وێستگەکانی ناردن و بۆرییە نەوتەکان ڕێژەی ناردنی نەوت لە کەرکوکەوە بۆ تورکیا و لەوێشەوە ناردنی بۆ پاڵاوگەی بایشی و ئینجا ناردنی بۆ بەندەری سیحانی تورکی لەسەر کەناری دەریایی سپی ناوەراست لە (٧٠٠,٠٠٠) بەرمیلەوە کەم بۆتەوە بۆ (٣٠٠,٠٠٠) بەرمیل، هەروەها یەکێك لە پسپۆرانی پیشەسازی نەوت بە گرووپی (کرایسز)ی ڕاگەیاندووە کە بەرهەمی ڕۆژانەی ئێستای بیرەنەوتەکانی کەرکوک بە (٣٥٠) تا (٥٠٠) هەزار بەرمیل دەخەملێنرێ کە زۆری کەمترە لەو تێکراییە هەرە بەرزەی لە پێش شەردا، واتە لە نەوەتەکاندا گەییە (٧٠٠) تا (٨٠٠) هەزار بەرمیل.

٣. برێکی زۆر نەوت لە کەرکوکدا هەیە بە جۆرێك کە ساڵی (٢٠٠٤) لە چوارچێوەی سەر لە نوێ ئاوەدانکردنەوەی (قەرەهەنجیر)ی وێرانکراو ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی غەیرە حکومی ویستبووی دوو بیری ئاو لێبدا نەوت وروژمی هێنابوو، قەرەهەنجیر گوندێکی کوردییە سەر بە پارێزگای کەرکوکە و کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی کەرکوکەوە لە دووری (١٠) کیلۆ مەتر لەسەر شەقامی نێوان کەرکوک و چەمچەماڵ و سلێمانی. ساڵی (١٩٨٨) لە چوارچێوەی شاڵاوێکدا دژی شۆڕشگێڕانی کورد ڕژێمی پێشووی عێراق وێرانی کرد.

٤. زۆر لە خەڵکەکە ڕایانکردبوو بۆ قەزاو ناحییەکان کە وێران نەکرابوو کە چی ڕژێم لەنێوانی ساڵانی (١٩٨٧) تا (١٩٨٩) ئەمانەیشی وێران کرد. هەندێکی دیکە ڕایان کردبوو بۆ سێ شارە کوردییەکە، بەڵام زۆربەی زۆرەکە بەناچاری بە کۆمەڵگاکان ڕازی بوونە کە خزمەتگوزارییەکانی تەندروستی و قوتابخانەیان تێدا بووە، بەڵام چەندین باری خراپیشی هەبووە وەك بڵاوبوونەوەی بێکاری و دووری لە ناوەندی شارەکانەوە و جۆرێك لە بێ ئۆمێدی لەوەی ئەو بارودۆخە چاك ببێ.

٥. دەتوانی بۆ زیاتر شارەزایی لە بارەی سیاسەتی تەعریبەوە کە ڕژێمی بەعس پیادەی کردووە بڕوانیتە ڕاپۆرتێکی (هیومان رایتس ووچ) بەناونیشانی:
(عێراق بە زۆر ڕاگواستن و دەرکردنی کەمە نەتەوەییەکان)، ئاداری ساڵی (٢٠٠٣)، لەسەر ئەم ئەدرەسە ئەلکترۆنییە:
http://www.hrw.org/repots/٢٠٠٣/iraq٠٣٠٣.tm

٦. بە پێی خەملاندنی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی کۆچ زۆربەی گەڕاوەکان بۆ پارێزگای کەرکوك ئەوانەن کە بۆ پارێزگاکانی باکووری عێراق دووەرخرابوونەوە، زۆربەی زۆری گەڕاوەکان نەچوونەتەوە زێدی ڕەسەنی خۆیان، بەڵام وا بەنیازن. ئێستا لە ژێر ڕەشماڵ و لە خانووبەرەی کاول و یاریگا و کۆنە سەربازگەکاندا لەناو شاری کەرکوکدا دەژین. هەڵبەت کۆسپ و تەگەرە زۆرن کە ئەمان ناتوانن بگەڕێنەوە بە تایبەتی چونکە خزمەتگوزاری لە گوندو ناوچەکانی خۆیاندا نییە و زۆربەیشی مینڕێژکراون و لە هەندێکیشیاندا هێشتا عەرەبی هاوردە لە خانووەکانیاندا یان لەسەر ئەرزەکانیان ماون و دەرنەچوون.

٧. وەك فەرمانبەرێکی فریاگوزاری ڕۆژی (٣١)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤) بە (کرایسز گرووپ)ی ڕاگەیاند: زۆربەی گوندییەکان پاش ئەوەی بیست ساڵە لە ئۆردوگاکاندا دەژین چیتر گوندیی نەماون و بنەما گوندییەکانی ژیان و پەیوەندییان بە کاروبارو چالاکی کشتوکاڵەوە نەماون. ئەمان لە هەوڵی ئەوەدان قوتابخانە بۆ منداڵەکانیان و خزمەتگوزاری ئاو و ئاوەڕۆ و تەندروستی دابین بکەن. ئەمان کە لە گوندێتی خۆیان داماڵراون و ئالوودەی ژیانی ئەو ئۆردوگایانەوە گرتووە کە ڕژێمی بۆی بیناکردبوون.

٨. خەملاندنی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی کۆچ لە ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٤)دا لەم بارەیەوە بەمجۆرەیە: بە بەکارهێنانی (٦) کەس وەك تێکرایی مامناوەندیی بۆ هەر خێزانێك، دەکرێ بڵێن (٧٢,٨١٠) هەزار کوردو (٢٣,٥٥٠) هەزار تورکمان لە ماوەی ساڵی ڕابردوودا گەڕاونەتەوە کەرکوك.

٩. یەکێك لە تورکمانە ئەندامەکانی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك کە سەر بە بەرەی تورکمانی عێراقە دەڵێ: لە سەردەمی سەدام حوسێندا تەنیا (٤٠٠) خێزانی کورد لە کەرکوك دەرکراون و گەرەکی شۆڕیجەش هەرگیز تێکەنەدراوە. (یەکێك لە ئەندامانی کرایسز گرووپ لە نیسانی ساڵی (١٩٩١)دا بە سیفەتێکی دیکە چووبووە کەرکوك بە چاوی خۆی بینیبووی کە شۆفل گەرەکی شۆڕیجەی لەناوبردووە).

هەر ئەو ئەندامە تورکمانە کە ناوی خدر غالیب کەهیە لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ گرووپەکەمان لە (٢)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤)دا گوتبووی زۆربەی هەرە زۆری ئەو کوردانەی دێن بۆ کەرکوك هەر لە ئەسڵەوە خەڵکی ئێرە نین و بەشێکیان گوندییەکانی دەورووبەرن و ئەوانی دیکە لە ئێران و تورکیا و سوریاوە هێنراون. ئەو کاتە گرووپەکەمان لە حاڵێکدا نەبوو ئەم قسانە پشتڕاست بکاتەوە یان بە پێچەوانەوە بیسەلمێنی وانییە، بەڵام ئەو بەڵگانەی هەبوون بەڵێ دەیانسەلماند کە وایە هەندێ لەو کوردانە لە ئێرانەوە هاتبوون تەنانەت دەشێ هەر لەوێش لەدایکبووبن، بەڵام لە

ڕووی یاساییەوە مافی خۆیانە کە بە کەرکوکی لە قەڵەم بدرێن. چونکە بۆ نموونە گەنجێکی کوردی تەمەن بیست ساڵ لە دیمانەیەکدا ڕۆژی (١)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤) بە ئێمەی ووت لە ئۆردوگایەکی نزیك شاری کرمانشاهی ئێران لەدایکبووە کە خێزانەکەی لە ساڵی (١٩٧٤)ەوە لەوێ جێگیربوون، ئەگینا بە ڕەسەن کەرکوکین و خەڵکی (چنگلاوە)ی کەرکوکن کە لە ساڵی (١٩٩١)دا ڕژێمی بەعس خاپووری کردووەو ئێستا هاتوونەتەوە لە شوێنەکەی خۆیدا ئاوەدانی بکەنەوە.

١٠. دیبلۆماتکارێك ڕۆژی (٣)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤)دا لە دیمانەیەکدا لەگەڵ گرووپەکەمان پێی ڕاگەیاندین کە ژمارەی دانیشتووانی گریمانەکراوی کەرکوك (٨٠٠) هەزار (ژمارەی دروست و سەلمێنراومان لا نییە)، (٣٠٠) هەزاریان عەرەبی تەعریب، لەوانەیە (٥٠) هەزار لەمانە بەر لە تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤) ڕۆیشتبن، نزیکەی (١٠٠) هەزار کوردی ڕاگوێزراویش گەڕانەتەوەو هاوین لە دەواری هەڵدراودا نیشتەجێبوون تا ئەو کاتەی خوێندن دەستی پێکردو ڕاگەیەنرا کە سەرژمێرییەکە دواخرا ئیتر نزیکەی (٣٠) هەزارێکیان گەڕانەوە بۆ سلێمانی و هەولێر. (لەو کاتەدا گرووپەکەمان لە حاڵێکدا نەبوو کە ئەم ژمارانە بسەلمێنێ).

١١. لە دیمانەیەکدا لەگەڵ کرایسز گرووپ ڕۆژی (٣) تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤) دکتۆر نوری تاڵەبانی کە پسپۆڕێکی کوردەو بە ڕەسەن خەڵکی کەرکوکە دەڵێ: ئەگەر حیزبە کوردییەکان لە نیسانی ساڵی (٢٠٠٤)دا نەچوونایەتە ناو کەرکوکەوەو کۆنترۆڵیان نەکردایە، ژمارەی کوردە دەرکراوە گەڕاوەکان زۆر زیاتر دەبوو، ئەو کاتە کێشەکانیش زۆرتر دەبوون، بۆیە بەرای ئەو (ئەمە ئەو هۆیەیە کە کوردە ڕاگوێزراوەکان بە داخڵبوونی حیزبە کوردییەکان خۆشحاڵ نەبوون و ئەوان لەوێ نەبوونایە عەرەبە هاوردەکانیان دەردەپەڕاند).

بەرپرسێکی پێشووی هێزە هاوپەیمانەکانیش لە پەیوەندییەکی ئەلکترۆنیدا ڕۆژی (٧)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥) پێی ڕاگەیاندین کە: (پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان شایستەی ئەوەن هەندێ تەقدیر بکرێن، چونکە لە ڕاستیدا ژمارەی ئێستای کوردە گەڕاوەکان لەوانەیە بەشێکی زۆر کەمی کۆی دەرکراوەکان بێ).

١٢. دیمانەی کرایسز گرووپ لەگەڵ بەرپرسی کۆمەکە نێودەوڵەتییەکان، هەولێر، (٢)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤).

١٣. ئەم عەرەبانە خەڵك ناویان دەبەن بە (عەرەبی دە هەزاری) چونکە لە کاتی خۆیدا ڕژێمی (١٠) هەزار دینار (نزیکەی ٣٠ هەزار دۆلار بە نرخی ئەوکاتە)ی دەدانێ و پارچە زەوییەکیشی لە کەرکوك دەدانێ کە خانووی لەسەر بکەن و نیشتەجێ بین.

١٤. دیبلۆماتکارێکی ڕۆژئاوایی ئەوە دوویات دەکاتەوە کە (شتێك نەماوە وا لە عەرەبەکانی تەعریب بکات لە کەرکوکدا بمێننەوە. چونکە کارو پیشەو ئەو سوودو قازانجەی نەیانکرد نەماوە. ئەوان ئێستا تەنیا چاوەڕێی ئەوە دەکەن قەرەبوو بکرێنەوەو لە جێیەك نیشتەجێ بکرێنەوە)، بڕوانە:
- دیمانە لەگەڵ کرایسز گرووپ، کەرکوك، (٢)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

١٥. لە دیمانەیەکدا لەگەڵ کرایسز گرووپ، ڕۆژی (٢٨)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤) لە ئەنقەرە، ئاوارەیەکی تورکمان شکایەتی حاڵی بەوە دەکرد کە کوردەکان لە کەرکوك دوو پەیکەری تورکمانیان شێواندووەو شکاندوویانن و ناوی شەقام و تەلارەکانیان لە عەرەبییەوە کردۆتە کوردی و ئاڵای کوردیان هەڵکردووەو لەمەش زیاتر ووتی: (هەست دەکەم ئەوەی دەیکەن کاری داگیرکارە).

یەکێك لە تورکمانە ئەندامەکانی ئەنجومەنی شاری کەرکوك سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ناوی نەخۆشخانەی (ئازادی) هەر لە نەخۆشخانەی (سەدام) بهێڵرێتەوە. خدر غالب کەهیە لەو دیمانەیەدا لەگەڵ کرایسز گرووپ ڕۆژی (٢)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤) حیزبە کوردییەکانی بەوە تاوانبار کرد کە لە نیسانی ساڵی (٢٠٠٣)دا هاتوونەتە کەرکوکەوە، دامودەزگاکانیان تاڵان کردووە بە قوتابخانەکانیشەوە، دەستیان بەسەر مەرکەزەکانی پۆلیس و بینایەی پارێزگاو دواتر دەستیان بەسەر ئەنجومەنی پارێزگاشدا گرتووە.

١٦. حەمید ئەفەندی وەزیری پێشمەرگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان ووتوویەتی: (ئێمە ئامادەین شەری هەموو لایەك بکەین لەپێناوی ئەوەدا دەست بەسەر کەرکوکدا بگرین، بەشی ئێمە لە کەرکوك زۆر کەمەو هەوڵ دەدەین زۆرترمان دەست بکەوێ).

لە (هیرالد تریبیۆن)دا ڕۆژی (٣)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥) (ریتچارد ا. ئۆپل جی ئار) دەڵێ: (کوردەکان هەوڵ دەدەن درێژە بە ئۆتۆنۆمییەکی فشەڵ بدەن).

١٧. د. سرود مەتی بەرپرسی پەیوەندییە گشتییەکان لە کۆمیتەی هەولێری بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری دەڵێ: (کەرکوك ناوچەی ناکۆکییە لەنێوانی دوو گەورە کۆمەڵەدا کە کوردو تورکمانە، هەر یەکەیان دەڵێن کەرکوك هی خۆیەتی)، هەروەها دەڵێ: (تورکمان و عەرەب پشتگیری یەك دەکەن، بەڵام مەسحییەکان چاودێرن، ململانێی ناو کەرکوك ململانێیەکی نەتەوەیی و مەسیحییەکان لایەن نین تێیدا)، بڕوانە:
- دیمانە لەگەڵ کرایسز گرووپ، (٢)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤).

١٨. لە دیمانەیەکدا لەگەڵ کرایسز گرووپ، کەرکوك، (٣)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤).

١٩. کرایسز گرووپ ڕاپۆرتی پێشووتری هەیە لە بارەی دەسەڵاتی سیاسیی گەورەی سیستانییەوە کە ئەو خۆی وا لە قەڵەم دەدات کە سیاسی نییە. هەر چەندە ئاماری بەڵگەدارمان نییە، بەڵام سەرچاوە ناوخۆییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە (٤٠٪)ی تورکمانەکان شیعەن و یەکگرتووی ئیسلامی تورکمانی کە شیعەیە، بۆ بەشداری کردنی لە هەڵبژاردنەکانی (٣٠)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥)دا

چووە ریزی ئیئتلاف یەکگرتووی عێراقییەوەو سیستانی ئەم کارەی موبارەکە کرد.

٢٠. هێڵی سەوز هێڵی ئاگربەستە، ئەو ناوچانەی لە یەکتر جیا دەکردەوە کە رژێم دەسەلاتی بەسەریاندا هەبوو لەگەڵ ئەوانەیان کە کوردەکان پاش هەڵبژاردنی ئایاری ساڵی (١٩٩٢) حکومەتی هەرێمی کوردستانیان لێ دامەزراندووە.

٢١. پەرلەمانی تورکیا لە (١)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٣) دا دەنگیدا کە نابێت هێزی سەربازی ئەمریکا کە (٦٠) هەزار کەس بوو بە تورکیادا تێپەرن بۆ کردنەوەی بەرەیەك لە باکووری عێراق، ئەم بریارە ئەمریکای زۆر تووڕە کردو وەك چاودێرێکی تورك دەڵێ: (وای کرد ئەمرۆ تورکیا هیچ رۆڵێکی لە باکووری عێراقدا نەبێ)، بە واتایەکی دیکە تورکیا وای لە خۆی کرد کە ببێتە لایەنێکی (ناپەیوەندیدار)، بروانە:
– دیمانە لەگەڵ کرایسز گرووپ، ئەنقەرە، (٢٨)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

٢٢. دیبلۆماتکارێکی رۆژئاوایی دەڵێ: (تورکیا ستراتیژییەتێکی نییە بۆ مامەڵکردن لەگەڵ سیناریۆ جۆراوجۆرەکان و ئەگەرە کراوەکانی باکووری عێراقداو هەموو رەفتارەکانی پەرچەکردارن).

٢٣. بۆ زانینی زیاتر لە بارەی ئەم زانیارییانەوە بروانە:
- (Diary). Charles Glass.
- Kerim Yildiz. (The Kurds in Iraq. Present and Future).
- David McDowall. (A Modren History of the Kurds). London. ٢٠٠٠.

٢٤. بە پێچەوانەی دراوسێیەکانی دیکەی وەك (ئەردەن و سعودییەو کوێت)ەوە، تورکیا خۆی نەکردە کەناڵێك بۆ تێپەربوونی چەك و تەقەمەنی و بە درێژایی جەنگەکە بێلایەنێکی سروشتی بوو.

٢٥. بەرپرسێکی تورك دەڵێ: (ئەگەر عێراق رووخا کوردەکان بۆ دەسەلات بە شەر دێن و باکووری عێراق ئاژاوەی تێدەکەوێ، هاوکات شیعەکان لە باشووری دەوڵەتی ئایینی رادەگەیەنن و بە حوکمی پەیوەندی روو لە ئێران دەکات کە ئەویش لای خۆیەوە بانگەوازو بەیاننامە ووروژێنەرەکان سەبارەت بە بڵاوکردنەوەی شۆرش لە ناو شیعەکانی کەنداو زیندوو دەکاتەوە. ئەمەش دەبێتە کێشە بۆ ئیسرائیل و بە هەمووشییەوە دەبنە هۆی ئاژاوەو شڵەژان لە ناوچەکەدا. بۆیە بۆ تورکیاو ئیسرائیل وا باشە عێراق بە یەکگرتوویی بمێنێتەوە)، بروانە:
– دیمانەیەکی کرایسز گرووپ لەگەڵ بەرپرسێکی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا لە ئەنقەرە، رۆژی (٢٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

هەر چەندە ئەگەری روودانی ئەم سیناریۆیە زۆر کەمە بەڵام لە ناوچەکەدا زۆر رێ تێدەچێ و رۆژگاری شەری (عێراق – ئێران) دێنێتەوە بیر کە گەورە هاوکاری عێراق سعودییەو ئەردەن و کوێت و دەوڵەتەکانی دیکەی کەنداو بوون کە هەموویان مەترسی ئەوەیان هەبوو ئێرانی (خومەینی) بیروباوەری شیعەگەرایی رەوانەی ناوچەکە بکات بە تایبەتیش بۆ ئەو وڵاتانەی شیعەیان تێدا دەژی و لە سعودییە هەر چەندە کەمینەن، بەڵام بەکەناری کەنداوی پر لە نەوتدا بڵاوبوونەتەوەو لە بەحرێنیش زۆرینەن.

٢٦. (دیمانەی کرایسز گرووپ لەگەڵ ئومیت ئۆزداغ، لێکۆڵەرەوەی سەربەخۆو دامەزرێنەری بنکەی توێژینەوە ستراتیژی و ئەوروپایی و ئاسیاییەکان)، ئەنقەرە، (٢٨)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

٢٧. دیمانەی کرایسز گرووپ لەگەڵ عوسمان کاولا کە لێکۆڵینەرەوەیەکی سەربەخۆیە، ئەستەمبول، (٢٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

٢٨. بۆ نموونە چاودێرێك سەرنجی ئەوەی داوە کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لە باکووی عێراق (لەوانەیە ببێتە هۆی دروست بوونی داواکاری سەربەخۆییانە لەو جێیانەی تورکیا کە زۆرینەی دانیشتووانەکەیان کوردن، یان وەك ئەگەرێکی دیکە لەوانەیە هانی هەندێك لە کوردەکانی تورکیا بدات کە سوورتر بن لەسەر ئەوەی داوای جیابوونەوە بکەن.
- Kemal Kirisci. (Between Europeand the Middle East: The Transformation of Turkish Policy). Middle East review of international affaris. Vol. ٨.

علي العنوان:
http://meria.idc.ac.il/jornal:. no.١(match٢٠٠٤)/٢٠٠٤/issue/jv٨n١a٤.html

٢٩. بەرپرسێکی گەورەی تورکیا دەڵێ: (سەربەخۆیی کوردستان یەکێك نییە لە خەیارەکانی تورکیا)، بروانە:
– دیمانەیەك لەگەڵ کرایسز گرووپ، ئەنقەرە، (٢٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

٣٠. یەکێك لە گەورە راوێژکارانی رەجەب تەیب ئۆردوگانی سەرۆکی حیزبی عەدالەت و گەشەی حوکمران و سەرۆك وەزیرانی تورکیا ئاماژەیەکی بەوە دا کە لەوانەیە بە دەوڵەتێکی کوردی لە باکووری عێراق رازی بن، بەڵام ئەوەیشی بۆ قسەکەی زیاد کرد کە: (ئەگەر کەرکوکی خرایە سەر ئەوە کێشە بۆ تورکیا دروست دەکات)، بروانە:
– دیمانەیەك لەگەڵ کرایسز گرووپ، ئەنقەرە، (٢٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

٣١. دیمانەیەك لەگەڵ کرایسز گرووپ، ئەنقەرە، (٢٧) ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤). کە چی پێش جەنگ چاودێران و سیاسەتمەدارانی تورکیا هەر هەموویان لەسەر ئەوە کۆك بوون کە (هەرگیز بە عێراقێکی فیدراڵ رازی نابین)، (چاوپێکەوتنێك لەگەڵ بولنت ئاگر جالی، سەرۆکی دامەزراوی دیموکراسی تورکیاو کۆنە وەزیر)، ئەنقەرە، (٣) ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٣). یەکێکی دیکەش ووتی: (ناتوانین جگە لەو ئۆتۆنۆمییەی لە دەستووری ساڵی (١٩٧٤)دا هاتووە بە هیچ شتێکی دیکە رازی بین)، لە دیمانەیەکی کرایسز گرووپدا لەگەڵ م. فاروق دیمیر جێگری سەرۆکی بنکەی ستراتیژییە پەرەسەندووەکان، ئەنقەرە (٤)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٣).

دیبلۆماتێکی ڕۆژئاوایی سەرنجی ئەوەی داوە کە: (بەر لە جەنگ قسەو باسی زۆر لە بارەی هێڵە سوورەکانەوە دەکرا. کە چی لە نیسانی ساڵی (٢٠٠٣)دا حیزبە کوردییەکان چوونە ناو کەرکوک و موسڵەوەو تورکیاش هیچی نەکرد. لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی تورکیا زۆر نوکتە لەسەر ئەمە دروستکرا، چونکە ئاشکرا بوو کە هەموو ئەو قسانە قسەی پڕوپووچ بوون)، دیمانە لەگەڵ کرایسز گرووپ، ئەنقەرە، (٢٨)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

٣٢. دیمانەر لەگەڵ کرایسز گرووپ، ئەنقەرە، (٢٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

٣٣. ئەم لێدوانەی بارزانی ئەو کاتە بوو کە چووبوو بۆ ئەنقەرە، بەڵام لەمەی لێی وەرگیراوە کەمتر زەقاوزەق بوو. بە پێی ئەوەی لە ئاژانسی (فرانس پرێس)دا ڕۆژی (١٢) ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤)دا بڵاوکرابۆوە، بارزانی ووتوویەتی: (هەر کەسێك یان ڕژێمێك یان ئاژانسێك بیەوێت درێژە بە تەعریب بدات یان خەڵکی کەرکوک بچەوسێنێتەوە ئەوا ئێمە داکۆکی لە مافەکانیان دەکەین و ئامادەین لەپێناویاندا بجەنگین)، هەروەها ووتوویەتی: (کەرکوک شارێکی عێراقییە، بەڵام ناسنامەکەی کوردستانییە، دەبێت هاندانی پێکەوژیان و برایەتی سەر لیستی ئەرکەکانی هەموومان بێت و ئێمە بەم ئاراستەیەدا کار دەکەین)، دوای دوو مانگ لەمە بە ڕۆژنامەنووسێکی ڕاگەیاندووە کە: (کەرکوک دڵی کوردستانە و ئێمە زۆری پێوە پابەندین، ئێستا ئێمە پشتمان بە دانوستان بەستووە، بەڵام ئەگەر ئەو عەرەبانەی هێنراون و لە کەرکوک نیشتەجێکراون نەڕۆن دەریان دەکەین)، لە ووتارێکی (Olivier Weber)دایە بە ناونیشانی (Le Point Kirkouk: Main basse sur lor noir)، (٢٣)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤)، (وەك ئەوەی کە کرایسز گرووپ لە فەرەنسییەوە وەریگێڕاوە).

٣٤. بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەکانی تورکیاوە تەماشای (کاسلین ڕۆدۆلفۆ) بکە: (تورکیا پلانێك بۆ عێراق دادەنێ)، ڕادیۆی ئەورووپای ئازاد/ ڕادیۆی الحرة، (٣)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤)، لەسەر ووتاری ڕۆژنامەی (الصباح)یشەوە ئەم برگەیەی وەرگرتووە (ئامانج و مەبەست گەلێك هەن لە یەکێتی ئەورووپا گرنگترن. چونکە کەرکوک لە ڕاستیدا دڵی کوردستان نییە، بەڵکو دڵی سیاسەتی تورکیایە لە عێراقدا)، کە چی (سامی کۆهینی) نووسەر لە ڕۆژنامەی (میللییەت) ئەم قسەیەی کەم بایەخ کرد کە پاشی لێدوانەکەی بارزانی بڵاوکرابۆوە. ئەم دەڵێ: (تا پێش ساڵێك کەرکوک لە نەخشەی گفتوگۆ سیاسییەکانی تورکیادا وجودی نەبووە).

٣٥. هەر چەندە هەندێ لە چاودێرانی بڕوایان بەم سیناریۆیەیە، بەڵام هەشیانە گومان دەکەن چونکە دەڵێن: (ئەمریکا هەرگیز ڕێگە نادات تورکیا سنوور دابخات)، بە قسەی دیبلۆماتیکی ڕۆژئاواییش بێت ئەوا (پەراوێزی مانۆڕی تورکیا بە باکووری عێراقدا تا ڕادەیەکی زۆر تەسك کراوەتەوە)، دیمانە لەگەڵ کرایسز گرووپ لە ئەنقەرە (٢٨)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

٣٦. سەرەرای ڕەچەڵەك و ڕەسەنییان، تورکمانەکانی عێراق لە ئاسیای ناوەڕاستەوە هاتوون نەك لە تورکیاوە. لەلایەنی ئیمپراتۆرییەکانی جارانی ئەم ناوچەیەوە وەك سەربازو بەردەست هێنراون و لە باکووری ڕۆژئاوای موسڵدا نیشتەجێ بوونەو بڵاوبوونەتەوە بەرەو ڕۆژهەڵاتی بەغدا. ئەمانە بوونەتە گەورە ئەفسەران و پیشەوەران و بازرگانان و ئیدارییەکان لە مەڵبەندی شارەکانی ناوچە دەشتاییە بە پیت و فراوانەکان و تێکەڵاوی کوردو ئاشووری و عەرەب بوون. تورکمانەکان بە زۆری لە شارەکانی موسڵ و تەلەعفەرو کەرکوک و هەولێرو ئاڵتون کۆپری و داقوق و توزخورماتوو و کفری و خانەقین و مەندلیدا نیشتەجێن.

٣٧. بەپێی هەندێ سەرچاوەی بڕوا پێ نەکراو (چونکە سەرچاوەی بڕوا پێکراومان نەبوون) نووسەرە تورکمانەکان پێیان وایە ژمارەی تورکمانەکان تا ساڵی (٢٠٠٢) دوو ملیۆن زیاتر نەبووە واتە (٨٪)ی دانیشتووانی عێراق. بۆ نموونە تەماشای کتێبەکەی (ئیرشاد هرمزی) بکە بە ناونیشانی (التركمان والموطن العراقي) ئەستەمبوڵ، ٢٠٠٣، هەندێکی دیکە لەمەی کەمتر دەخەمڵێنن و دەڵێن (١,٢٥) ملیۆنن، دیمانە لەگەڵ جەودەت نەجار سەرۆکی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری تورکمان، هەولێر (٦)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٣).

٣٨. لە دیمانەیەکدا (عوسمان کاولا) لە ئەستەمبوڵ ڕۆژی (٢٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤) ئاوای بە (کرایسز گرووپ)ی ووتووە و کەشکۆڵی بەریتانیش کە باسی کەرکوک دەکات لە پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا دەڵێت شارێکە زیاتر خەسڵەتی تورکمانیی هەیەو خەڵکی عەرەب و کوردیشی لێیە.

٣٩. دیمانەی کرایسز گرووپ لەگەڵ جەنگیز چاندار، ئەستەمبوڵ ڕۆژی (٢٦) تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

٤٠. دەسەڵاتی ئینتیدابی بەریتانی و حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق بە درێژایی ساڵانی سەدەی بیست گوندەکانی کوردیان بۆردومان کردووە. ئەم ئۆپاراسیۆنە درێژخایەنانە بەشێك بوون لەو هەڵمەتانەی کراون بۆ ڕاگرتنی یاخیبوونی چەند باربووەی کوردەکان دژی ئەو سیاسەتانەی حکومەت کە بە سیاسەتی سەرکەوت و ڕەگەزپەرستیان زانیوەو بەرهەمی (هەڵەی یەکەم) بوون کە پەیمانیان پێدرا دەوڵەتیان بۆ دروست بکرێ و دوایی لەو پەیمانە پەشیمان بوونەوە.

٤١. دیمانەی ئیحسان دۆغرەمەچی لەگەڵ کرایسز گرووپ لە ئەنقەرە، ڕۆژی (٢٧) تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤)، دۆغرەمچی هاووڵاتییەکی تورکمانە خەڵکی هەولێرەو دامەزرێنەری زانکۆی (Bilkent) لەمبارەیەوە ووتی: ئەو گۆڕانکارییەی ئاماژەی پێ کراوە لە ناوچە کوردییەکان بوو، لە کەرکوک زمانی تورکی کرایە عەرەبی وەك زمانێکی سەرەکی لە خوێندن و حکومەتدا، لە ساڵی (١٩٥٠) دوا دەیەی دەسەڵاتی پادشایی بەکارهێنانی زمانی تورکی لە قوتابخانەکان قەدەغە کراو لە ساڵی (١٩٧٠) ڕژێمی نوێی بەعس مافی ڕۆشنبیری و زمانی جێبەجێ کرد و دوای کەمتر لە یەك ساڵ بە بڕیاری ژمارە (٨٩)ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لێی پاشگەزبۆوەو پرۆگرمەکانی خوێندنی کردەوە

بە عەرەبی و مافە رۆشنبیرییەکانی تورکمانی پێشێل کردەوە.

٤٢. دیمانەی کرایسز گرووپ لەگەڵ نوێنەری رۆژنامەی (Radikal) (مرات یتکن) لە ئەنقەرە، رۆژی (٢٩)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

٤٣. بەرەی تورکمانی (ITF) لە ئایاری ساڵی (١٩٩٥)دا دروست کراو لە کۆنگرەی تورکمانی نێودەوڵەتی لە تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٢)دا بووە بەرەیەك چوار حیزبی تورکمانی دیکەش هاتنە ریزییەوە. ئیحسان دۆغرەمەچی کە بزنزمانێکی عێراقی تورکمانی دەوڵەمەندو پەروەردەیی و سیاسییەو لە ئەنقەرە دەژی بە کرایسز گرووپی ووت کە ئەم رێی بە بەرە نیشانداوە کۆمپانیایەك بۆ پارەو پولی حکومەتی تورکیا دابمەزرێنێ تا لەو رێیەوە پارە بۆ بەرە بنێرێت.

٤٤. دیمانە لەگەڵ (خدر غالب کەهیە) لە کەرکوك لە (٢)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

٤٥. دەنگۆیەکی وا هەیە کە ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی بەرەی تورکمانی عێراقی نارازین لە حیزبەکەیان، بەڵام ئێستا ئەلتەرناتیڤێك بۆ بەرە نییە مەگەر یەکگرتووی ئیسلامی تورکمانی کە هاوپەیمانێتییەکی بنکە شیعییەو توانای کێشکردنی ئەندامە سوننە مەزهەبەکانی ناو بەرەی نییە. هەندێ لە چالاکەوانانی تورکمان بیر لەوە دەکەنەوە حیزبێکی تورکمانی دابمەزرێنن و ببێتە (رێگای سێیەم) بەڵام هیشتا خەریکی پێکەوە نانین.

٤٦. بە قسەی (جەنگیر چاندار) هێزە تایبەتەکانی تورکیا بەرەیان دروست کردووەو دەستیان بەسەردا گرتووە: (بۆ ئەوانەی لە پەرەسەندنەکانی ناوچەکە دەکۆڵنەوە، ئەو راستییەی کە بەرەی تورکمانی رێکخراوێکی سەربەخۆ نییەو پاشکۆی سوپای تورکیایە، نهێنییەکی (راگەیەنراو)ە، بەڵام دەشێ بەم رادەیە مەسەلەکە بۆ جەماوەی تورکیا روون نەبێت)، دیمانە لەگەڵ کرایسز گرووپ، ئەستەمبوڵ، (٢٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

٤٧. لە کۆبوونەوەیەکدا، رۆژی (٢٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤)، وەك هۆشدارییەك بۆ تورکیا ئاماژە بە رۆڵی بەرەی تورکمانی عێراق کرا کە هەوڵ دەدات تورکیا کێش بکات بۆ یارمەتیدانی تورکمانەکانی عێراق، ئەمە بە رای زۆربەی ئەو چاودێرو سیاسەتمەدارانەی دژی لەشکرکێشین، وەك سیناریۆ تۆقینەرەکەی قوبرسەو دەبێت تورکیا ئومێد بخوازێ روونەداتەوە. ئەمانە دەڵێن: تورکیا هێشتا ئەوەی بە ئەستۆوەیە کە خۆی لەو (قەیران)ە رزگا بکات کە بە هۆی دەستێوەردانی سەربازیی لە قوبرس بۆ خۆی دروست کرد. هەڵبەتە ئەمرۆ کە دەیەوێت بچێتە ریزی یەکێتی ئەورووپاوە مەترسییەکان یەکجار گەورەترن).

٤٨. یەکێك لە لێکۆڵەرەوان ووتی: (ئەمریکییەکان ئەو قبووڵ ناکەن لە مەسەلەی کەرکوکدا فشاریان بۆ بهێنرێت. ئەوان دەیانەوێت ببنە ناوبژیوان لەنێوانی لایەنەکانداو فشاری زۆرتریان بۆ ببەن. ئەوان بە دوای دەرچەیەکدا دەگەرێن لە عێراق دەریان بکات)، دیمانە، ئەستەمبول، (٢٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

٤٩. سەرچاوەکان دەڵێن لە واشنتۆن دەزانن مەسەلەکان چۆنن، بەڵام لەسەر ئەوە کۆك نین کە ئایا باشتر وایە وڵاتە یەکگرتووەکان سیاسەتێکی بەهێز لە کەرکوك پیادە بکات یان لێی بگەرێ بۆ عێراقییەکان خۆیان کێشەکانی خۆیان چارەسەر بکەن؟ لە ئاسۆدا هەندێ جموجۆڵ هەن وا پێ دەچێ سیاسەتی واشنتۆن رووی لە گۆران کردبێ لە بارەی سەر لە نوێی پیادەکردنەوەی تەعریبەوە. جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (ریتچارد ئارمیتاج) لە ئەنقەرە لە کانوونی دووەی ساڵی (٢٠٠٥)دا ووتی: (شتگەلێك لە یاسای حکومەتی ئینتیقالیدا هەن دەبێت بگۆردرێت بۆ ئەوەی ئەو هەڵانە چارەسەر بکرێن کە دووچاری هەر کەسێ بووە کە دەرکرابێ یان راگوێزرابێ)، بێگومان ئەمە تەنیا ئاماژەیەکی راشکاوانە نییە بۆ کوردو تورکمانەکان، بەڵکو بۆ عەرەبە (هاوردەکان) یشە لە کەرکوك، کە لەوانەیە بە هۆی نەبوونی چاودێرییەکی نێودەوڵەتی کاریگەرەوە ببنە قوربانی دەرکردنێکی رێکنەخراو، بە پێ مادەی (٥٨) لە یاسای ئیدارەی کاتیی عێراق کە پەیوەندیدارە بەم بابەتەوە، دەستووری عێراق ئەو هەنگاوانە دیاری دەکات بۆ (چارەسەرکردنی ئەو زوڵمەی رەفتارەکانی رژێمی پێشوو لە رێی گۆرینی دیمۆگرافیای هەندێ ناوچەوەن لە ناویاندا کەرکوك، بە خەڵکی عێراقیان گەیاندووە). ئەم ماددەیە نارۆشنەو واڵایە بەسەر چەندین لێکدانەوەی دژ بە یەکدا کە لەوانەیە ببێتە هۆی پێشێلکردنی مافەکانی عەرەبە (هاوردەکان) لە کاتێکدا کە ئەمریکا دەیەوێت دەلاقەی نێوان خۆی و عەرەب پربکاتەوە. دیبلۆماتێکی رۆژئاوایی بە کرایسز گرووپی ووت: وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناتوانێ ماددەی (٥٨) وا نەبینێت وەك ئەوەی کە ئەمیش رازی بووە پاکتاوی رەگەزیی عەرەبەکانی کەرکوك بکرێ. (٨)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤). بۆ مەسەلەی هەموارکردنی ماددەی دیکەش بەرپا بکات و بارێکی وا بخولقێنێ لە کۆتاییدا بگات بەوەی هەمو یاساکە ئیلغا بکرێ.

٥٠. ئاژانسی رۆژنامەگەریی فەرەنسا، (١٣)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

٥١. ژمارەی جەنگاوەرانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە زنجیرە چیای قەندیل لەسەر سنووری ئێران لە رۆژهەڵاتی شارۆچکەی (قەڵادزێ)ی سەر بە پارێزگای سلێمانی بە (٥٠٠٠) چەکدار دەخەملێنرێ و یەکێتی نیشتمانی کوردستان کۆنترۆڵی جموجۆڵیانی کردووە.

٥٢. (داو جۆنز)، (٢٥)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٤): (بۆش بەڵێن دەدات یارمەتی تورکیا و عێراق بدات دژی یاخیبووەکانی پ. ك. ك.)، کە چی (سۆزان سایکس) رۆژی (١٣)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥) بە ناونیشانی (وڵاتە یەکگرتووەکان یارمەتی تورکەکان دەدات لە دژی کوردەکان)، ووتارێکی لە رۆژنامەی (هیرالد تریبیوّنی نێودەوڵەتی)دا بڵاوکردووە. جێگری وەزیری دەرەوەی عێراق (حامید ئەلبەیاتی) بۆ ئاژانسی رۆژنامەگەریی فەرەنسا رۆژی (١٢)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥) ئاماژەیەکی بۆ ئەم بابەتە کردووەو ووتوویەتی: (باسی کردەوەی سەربازیمان کرد، بەڵام ئێستا

ئێمە لە قۆناغێکداین دەمانەوێت هەڵبژاردن سەرکەوێ. لە ئایندەدا کۆدەبینەوەو دواجار بەڵێ ئۆپاراسیۆنێکی سەربازیی ئەنجام دەدەین).

٥٣. سەرەتا تورکیا لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٦٤)دا لەگەڵ کۆمەڵەی ئابووری ئەورووپادا ڕێکەوتنی شەراکەی کرد، لە نیسانی ساڵی (١٩٨٧)دا داوای کرد ببێتە ئەندام لە یەکێتی ئەورووپا، لە کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٩٦)دا یەکێتی ئەورووپاو تورکیا یەکێتییەکی گومرگییان دامەزراند، دوای سێ ساڵ لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٩)دا یەکێتی ئەورووپا تورکیای بە ئەندامی پاڵێوراو وەرگرت. ساڵی (٢٠٠٢) یەکێتی ئەورووپا بەڵێنیدا کەی تورکیا دەستی کرد بە جێبەجێکردنی ژمارەیەك مەرج ئەمانیش دەست بکەن بە دانوستانی بە ئەندامبوونی لە (٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤)دا، لیژنەی ئەورووپی بە ئەنجومەنی ئەورووپای ڕاگەیاند کە تورکیا (بە پێی پێویست) ئەو مەرجانەی جێبەجێ کردووەو ڕایسپاردن کە ئەو دانوستانە دەست پێ بکەن. بەلای کەمییەوە تورکیا تا ساڵی (٢٠١٥) نابێتە ئەندامی یەکێتی ئەورووپا.

٥٤. ڕاپرسییەکان وای نیشان دەدەن کە (٨٧٪) کوردەکان لایەنگیری ئەوەن تورکیا ببێتە ئەندامی یەکێتی ئەورووپا، کە چی لە بەرامبەر (٧٨٪)ی ئەوانەی تەنیا بە تورکی قسە دەکەن لاگیربوون.

٥٥. بۆ نموونە عەبدوڵڵا گول وەزیری دەرەوەی تورکیا، ڕایگەیاند کە بە توندی لایەنگیری هەڵبژاردنەکانی عێراقەو ئەوەی دووپات کردەوە کە پێویستە بە پێی توانا هەڵبژاردن سەرەتاسەریی بێت و بۆ هەموو عێراقییەکان بێت و بە شێوەیەکی تایبەتیش لێ نەگەڕێن عەرەبی سوننە لە دەرەوەی ئەو پرۆسەیە بمێنێتەوە.

٥٦. سەرچاوەکانی ئەم زانیارییانە بریتین لە:

– دیمانەیەك لەگەڵ کرایسز گرووپ لە ئەستەمبوڵ، (٢٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

– ئاژانسی ئانەدۆڵ بۆس دەنگوباس، (١٢)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤).

– ئاژانسی ڕۆژنامەگەری فەرەنسا، (١٧)ی ئابی ساڵی (٢٠٠٤).

– پەیوەندی ئەلتکرۆنی لەگەڵ پسپۆڕێکی پیشەسازی نەوت لە (١٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤).

– وەزیری بازرگانی تورکیا کە قسەکانی لە ئاژانسی ڕۆژنامەگەریی فەرەنسا، لە (١٧)ی ئابی ساڵی (٢٠٠٤)دا بڵاوکرابۆوە.

– ڕۆژنامەی هەواڵەکانی ڕۆژانەی تورکیا، لە (١١)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤).

٥٧. جەنگیر جاندار لە ووتارێکی خۆیدا بە ناونیشانی (نزیکبوونەوەی تورکی – کوردی سەرەڕای ئەمریکییەکان) گفتوگۆ لە بارەی ئەم خاڵەوە دەکات، هەواڵەکانی ڕۆژانەی تورکیا (٢٣)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٤).

٥٨. بەرپرسێکی پێشوو لە دەسەڵاتی کاتیی هاوپەیمانان ئاماژەی بۆ میکانیزمێکی هاوشێوە کرد کە بۆ شاری بەرکۆی یوگۆسلافیای پێشوو دارێژراو هۆشداری ئەوەیشیدا کە ئەگەر کار بەم میکانیزمە نەکرێ ئەوا لە کەرکوکدا قەسابخانەیەکی گەورە بەرپا دەبێت.

٥٩. ئەم پێشنیارە (عوسمان کاولا) پێشکەشی کردووە، (کاولا) توێژەرەوەیەکی سیاسی سەربەخۆیە لەگەڵ ڕێکخراوێکدا کاردەکات لە (دیار بەکر) ناوی (کلتووری ئەنادۆڵ)و بڵاوبوونەوەی ئاڵوگۆڕی ڕۆشنبیریو ئاشتبوونەوە ئامانجییەتی. شایانی باسە لە تەمووزی ساڵی (٢٠٠٣)دا حکومەت لێبووردێکی ناکاملی ڕاگەیاند بۆ ئەو جەنگاوەرانەی حەز دەکەن خۆیان تەسلیم بکەن و ئامادەش بن زانیاری لەسەر ئەو هاوڕێیانەیان بدەن، کە خۆیان شاردۆتەوە، پەیوەندی لەگەڵ لێکۆڵەرەوەیەکی تورك لە (١٠)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٥).

*** عێراق و کورد.. شەڕی یەکلاکەرەوە لەسەر کەرکوك:**

"بە پێچەوانەی ئەو پێشبینیی و ترسە زۆرەی کە هەبوو، کەرکوك لە دوای ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام لە نیسانی (٢٠٠٣)وە بە شێوەیەکی گشتی دوورە لە توندو تیژی مەزهەبیی و نەتەوایەتی، لە کاتێکدا باری ئارامی ناوچەکە ناجێگیرە. دەرکەوتنی کورد بە سەرکەوتوویی دوای دەیان ساڵ خەبات و تێکۆشان ئاماژەی گۆڕانێکە لە کەرکوك و ناوچەکانی تری باکوور کە ناوچەی دەوڵەمەندن بەنەوت و کورد وەك بەشێك لە هەرێمی کوردستانیان ئەژمار دەکات.

سەرکردەی (پارتی دیموکراتی کوردستان)و (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) بە بەکارهێنانی سیاسی خۆیان لە بەغدا هاوکاری دارشتنی چوارچێوەیەکی دەستووری وایان کردووە کە نەوەك تەنها سیاسەتی بەعەرەب کردنی دەیان ساڵەپێچەوانە دەکاتەوە بەڵکو ئاسانکارییەکە بۆ گێڕانەوەی هەموو ئەو ناوچەنەش بۆ سەر هەرێمی کوردستان. سەرکردەکانی کورد لەو بڕوایەدان کە ئەم کارە بە هەوڵ و ماندوو بوونی زیاتری پێداچوونەوەیەك دەبێت بەسیاسەتەکانی ڕژێمی پێشوو (بەگێڕانەوەی کوردە ئاوارەکان. دەست گرتن بەسەر دامودزگا سیاسیش کارگێڕیی و ئەمنییەکان و ناردنەوەی عەرەبە هاوردەکان دەبێت)و دەبێتە هۆکارێك بۆ بردنەوەی ڕیفراندۆمی ناوخۆی کەرکوك کە ئەمەش کۆتایی ساڵی (٢٠٠٧) چارەنووسی کەرکوك و ناوچەکانی تری ململانێ، دیاریدەکات پێش قەیرانی یەکلاکەرەوەی کەرکوك و ناوچەکانی تری ململانێ، لەوانەیە لە چەند مانگی داهاتوودا بە لای یەکێك لەم دوو ڕێگایانەدا بکەوێتەوە.

**یەکەم:**

کوردەکان دەبێت هەوڵی زیاتر بدەن بۆ وەگرتنەوەی ئەو ناوچانە چ بە ڕێگەی یاسایی یان بە زەبری هێز ئەمەش بە دڵنیاییەوە لەلایەن نەتەوەکانی ترو حکومەتی ناوەندیو لایەنە ئەقلیمییەکانیشەوە بەرهەڵستی دەکرێت و ئەگەری ئەوەش هەیە کە ئەنجامی کۆتایی بە شەڕی ناوخۆو دەست تێوەردانی سەربازی دەرەکی بگەڕێتەوە.

**دووەم:**

لەوانەیە پرسی كەركوك ببێتە هۆی سەرەكیی دروست بوونی دەركەوتنی كۆسپ و تەگەرە لە بەردەم پرۆسەی سیاسی نیشتیمانی دا چونكە دەستووری نوێ رێگە بە هەرپارێزگایەك دەدات كە ببێت بە هەرێمێكی سەربەخۆ یان لەگەڵ پارێزگاكانی تردا یەكبگرنەوەو ببن بە هەرێمێك و ئەم خاڵەش لەلایەن سەركردەكانی تر بە شیعەكانیشەوە دژایەتی دەكرێت و هەوڵ دەدەن كە لە پرۆسەی چاوخشاندنەوە بە دەستووردا ئەم خاڵە بەرچاو بگیرێت و هەر گۆڕانكارییەكیش لە دەستووردا بكرێت دەبێت رەزامەندی كوردی لەسەربێت چونكە ئەگەر كوردەكان رەزامەند نەبن لەسەر كەركوك و ناوچەكانی تری داوای دەكەن بەشداری پرۆسەكە ناكەن، لەبەرئەوەی داواكردن و بەدەست هێنانی كەركوك لەلایەن كوردەكانەوە هێڵی سوورە بۆ زۆرێك لە عەرەبەكانی عێراق بۆیە ئەگەری ئەوە هەیە كە ئەم كێشەیە ببێتە رێگر لە بەردەم دەستوورو لەباربردنی پرۆسەی سیاسی.

*** پێشبركێی داواكارییەكان و پۆستەكان:**

لە پشتێنەی فراوانی كوردستانەوە كە كوردستان لە عەرەبی عێراق جیا دەكاتەوەو هەر لە شەنگار لە باكوری رۆژئاوا بەرەو تەلەعفەرو موسڵ و كەركوك و خورماتوو تا خانەقین و مەندەلی كە كەوتۆتە رۆژهەڵاتی بەغدا، عەرەب و كوردو توركمان و ئاشوری و شەبەك سەدان ساڵە پێكەوە ژیاون.

لە رووی ئاینییەوە پێكهاتوون لە موسڵمانی سوننەو شیعەو مەسیحی و یەزیدییەكان. ئەم كۆمەڵگانە ژن و ژنخوازییان لەنێواندا هەیەو لەگەڵ ئەوەشدا كەلتورو زمانی خۆیان پاراستووە. بە شارو گوندو خێڵ و شارستانییەوە پێكەوە ژیانیان بەسەر بردووە هەر چەندە هەندێ جار ململانێ لەنێوانیاندا هەبووە بەڵام بە شێوەیەكی گشتی بە ئاشتی پێكەوە ژیاوون.

ئەوەی پێش ئێستای كەركوكییەكان بە خۆشییەوە باس لەو رۆژانە دەكەن كە لە سەردەمی مەلیك دا شارەكەیان لە زۆرینەی كوردو توركمان و هەندێ لە كریستیان و جولەكە پێكهاتبوو و دەگێرنەوەو دەڵێن: (زۆر زۆر جوان بوو بەراستی جوان بوو).

وا رێككەوتووە كە ئەو سنوورەی ئەم نەتەوانەی تیادا هەڵكەوتووەو پێكەوە نیشتەجێن، دەوڵەمەند بن بە سەرچاوەكانی نەوت و گازو ناوچەكە یەكێكە لە كێڵگە گەورەكانی نەوت كە (١٣٠٥) بلیون بەرمیل نەوتی پاشەكەوتی (هەڵگیراو) هەیە كە دەكاتە رێژەی (١٢٪) و دەكەوێتە باكوری رۆژئاوای دەرەوەی شاری كەركوك. دوا بەدوای دۆزینەوەی نەوت لە ساڵی (١٩٢٠)دا رژێمە یەك لەدوای یەكەكانی عێراق بە تایبەتی رژێمەكانی دوای ساڵی (١٩٥٨)دا زنجیرییەك هەڵمەتی بە عەرەب كردنیان دەست پێكرد بۆ ئەوەی بەشێوەیەكی دراماتیكی دیمۆگرافی كەركوك بگۆڕن و هەر بەم سیاسەتەش دەیان هەزار عەرەبی هاوردەیان هێنایە كەركوك كە زۆر بەیان عەرەبی شیعەی هەژارو كەم دەرامەت بوون و لە باشوورەوە هێنابوویان و لە شوێنی كەسانی تری كە عەرەب نەبوون نیشتەجێی كردن و خەڵكە رەسەنەكەشیان دەرپەراند یان بە زۆر كردنیان بە عەرەب لە رێگەی گۆڕینی ناسنامەی نەتەوایەتیان لە نێو ئەمانەشدا كورد زۆر بە خراپی بەركەوت و بەرادەیەكی زۆرو بەرفراوانەوە كورد كەوتە بەر هەڵمەتی راگواستن و بە تایبەت گوندنشینەكان لە ماوەی هەڵمەتی جینۆسایدی ئەنفال لە ساڵی (١٩٨٨) كەوتنە بەر شاڵاوەكەو كوشتارێكی زۆریان لێكرا بە تایبەت ناوچەكانی دەوروبەری كەركوك.

هیچ ئامارێكی باوەرپێكراو نییەو عێراقییەكان باوەر بەم ئامارە ناكەن لەبەر ئەوەی رژێمی پێشتر بە ئارەزووی خۆی ئەو ئامارەی ئەنجامداوەو فشاری گۆڕینی ناسنامەی نەتەوایەتی لەسەر ئەو ناوچانە چڕ كردبووەوە كە ناوچەی ستراتیجی بوون و لە نەتەوەی عەرەب نەبوون بۆ ئەوەی بە زۆر خۆیان بكەن بە عەرەب. ژمارەی دانیشتووانی پارێزگای كەركوك لە كاتی ئێستادا دەگاتە (١,٥) یەك ملیۆن و نیو كەس كە (٨٠٠) هەزار كەسیان لە ناو شاردا نیشتەجێن. پێش سیاسەتی بە عەرەب كردن ئامارەكانی ساڵی (١٩٥٧) جێگەی متمانە بوون و دەریان دەخست كە كورد زۆرینەن لە پارێزگاكەدا هەرچەندە تا رادەیەك توركمان لە نێو شارەكەدا زاڵ بوون.

مێژووو ئەزموونی نوێی كوردەكان رەنگدارێژەری تێروانینی چوار نەتەوە سەرەكییەكەو مافەكانیان لە ناو كەركوك یان بۆ خودی شاری كەركوك.

**أ. خوێندنەوەی كورد سەبارەت بە پرسی كەركوك:**

هەر چەندە كورد ناوچەی كەركوك و هەموو ئەو ناوچانەی كە كێشەیان لەسەرە بەناوچەی پێكەوە ژیانی نەتەوەو ئاینەكان دەناسن (كە لە دەستووری نوێدا بە ناوچەكانی ململانێ ناوزەدكراوە) بەڵام كوردەكان لە ووتارە گشتییەكانیاندا سووربوونی خۆیان پێشان دەدەن كە كەركوك بەشێكی دانەبراوە لە كوردستان. كوردەكان لە بەندەكەدا پێداگیری زیاتر لەسەر پێوەری جوگرافی دەكەن نەوەك پێوەری ئەتنیكی و رایدەگەیەنن كە كەركوك شارێكی كوردی نییە بەڵام شارێكی كوردستانییەو ئەوە رەتدەكەنەوە كە كە هۆكاری داواكاریان بۆ شارەكە لەبەر بەرژەوەندی بوونی نەوت بێت لە ناوچەكەدا بەڵكو جەخت لەسەر ئەوە دەكەنەوە كە كەركوك شارێكی مێژوویییەو لە دێرزەمانەوە كوردی تێدا ژیاوە.

كوردەكان دەڵێن ئەگەر كەركوك پایتەخت نەبێت ئەوا بەشێكی دانەبراوە لە ویلایەتی شارەزوور كە دواترو لەسەردەمی عوسمانییەكاندا بە ویلایەتی موسڵ ناو دەهێنرا. بۆ نموونە (د. نوری تالەبانی) كە نووسەرێكی خەڵكی كەركوكەو بابەتی زۆری لەسەر كەركوك نووسیوە دەڵێت: (كەركوك شارێكی كوردی نییە بەڵام بەشێكە لە كوردستان و سنوورەكانی كوردستان زۆر ئاشكران و لە سەردەمی عوسمانییەكاندا ویلایەتی شارەزوور بووەو

هەمیشە کەمایەتییەکانی تری تێدا هەبووە بەڵام هەردەم بە ویلایەتی کوردان ناسراو بووە).

لەگەڵ ئەوەشدا بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٥٧)، پێش پرۆسەی بەعەرەب کردن، کورد زۆرینە بووە لە ناوچەی کەرکوك (بە بەراوورد لەگەڵ شاری کەرکوك). تورکمان بەشێوەیەکی رێژەیی بەم زووانە گەیشتونەتە کەرکوك‌و بە کرێگراوی ئیمپراتۆریەتی عوسمان بوون‌و هاووڵاتییە عەرەبە رەسەنەکانیش وەك خێڵە کۆچەرییەکان لە کەرکوك مێژووی نیشتەجێبوونیان تازەیە. کورد هەردوو گرووپی تورکمان‌و عەرەب‌و هەروەها کەمایەتییە کریستیانەکانیش بە هاووڵاتی رەسەنی شارەکە دەزانێت‌و هەموویان بە کەمایەتییە ماف پارێزراوەکانی کوردستان ئەژمار دەکات. بە پێچەوانەوە کورد دەیەوێت عەرەبە هاوردەکان بگەرێنەوە ناوچە رەسەنەکانی پێشووی خۆیان. هەڵبژاردنی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥)ی شاری کەرکوك‌و ریفراندۆمی دەستووری ئۆکتۆبەری ساڵی (٢٠٠٥) نیشانی دا کە ئەمرۆ کەرکوك لە زۆرینەی کورد پێکهاتووە.

کورد ئەوە دووپات دەکاتەوە کە زەحمەت‌و مەینەتی زۆریان بینیوە لەپێناو کەرکوکداو جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە لە کاتی گفتۆکۆکاندا چەندین جار داواکارییەکانیان خستووەتە بەردەم رژێمەکانی پێشتر بەڵام بە پێچەوانەوە بەرهەڵستی کراون‌و ناچارکراون بە دوورکەوتنەوەو وەستاندنی گفتوگۆو دەگەرانەوە بۆ توندوتیژی‌و خەباتی چەکداری. بەلای کوردەکانەوە جگە لە گێرانەوەی کەرکوك‌و ناوچەکانی تر بۆ سەر هەرێمی کوردستان هیچ شتێکی تر مافەکانیان ناسەلمێنێت کە لە شاڵاوی ئەنفال دا لە ناوچەی گەرمیان بە دەیان هەزار پیاو ژن‌و منداڵ راپێچ کراون ولە دووری کوردستان گوللەباران کران‌و لە گۆرە بە کۆمەڵەکاندا ژێر خاك کران.

کورد داوای ماف گەرانەوەی ئاوارە کەرکوکییەکان دەکات بۆ زێدی باوووباپیرانی خۆیان بەو منداڵانەش کە لە دەربەدەری لەدایکبوون‌و هەروەها داوا دەکەن ئەو ناوچەنەی کە کوردی تیادا باڵا دەستەو بۆ گۆرینی دیمۆگرافی خراونەتە سەر پارێزگاکانی هاوسێی کەرکوك، بگەرێندرێنەوە سەر پارێزگای کەرکوك. هەروەها داوا دەکەن کە کەرکوك بکرێتە پایتەختی هەرێمی فیدراڵی کوردستان بەو ناوچانەشەوە کە بە بەشێکی رەسەنی هەرێمی کوردستان دادەنرێن‌و لە ژێردەستی سیاسەتی بە عەرەبکردن ئازاریان چەشتووە.

داواکاری کورد پابەندبوونێکی دژوارو نەسازە، لە لایەکەوە کورد سوورە لەسەر ئەوەی کە کەرکوك شارێکی کوردی نییە بەڵام شارێکی کوردستانییە. لەلایەکی ترەوە کوردەکان ناتوانن ئەوە روون بکەنەوە کە بۆچی دەبێت کەرکوك بەشێکی دانەبراوی هەرێمی کوردستان بێت لە کاتێکدا ئەگەر شارێکی کوردی نەبێت بۆچی ناوچەیەکی پێکەوە ژیان نەبێت کە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژیش نەتەوەکان پێکەوە ژیاون‌و کێشەیان نەبووە، ئاشکرا نییە کە بوونی مێژوویی کورد لە کەرکوك بە راستییەکی حاشا هەڵنەگر دابنرێت‌و ببێت بە داوایەکی سیاسی کوردی بۆ ناوچەکەو بەتایبەتی لە کاتێکدا کە بوونی ئەو پێشبرکێیە داواکاری زۆری دروست کردووە لەسەر ناوچەکەدا.

داواکاری کورد بۆ کەرکوك کە تەنانەت هەندێ لە کوردە رۆشنبیرەکانیش ئەوە دەخەنە روو ئەم داوایە شتێکی تازەیە (داوای ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەو لە چوار چێوەی خەباتی رزگاری نیشتمانی زۆر بە هێزترە لە خەباتی ساڵانی شەستەکان بە دواوەو وا دەردەکەوێت کە بە هێزتر نەبێت لە داواکارییەکانی تر). هەر چۆنێك ئەم داواکارییە رەتکرابێتەوەو بەهەر شێوەیەك لە شێوەکان بێت داوایەکی مێژوویی کوردەکانە کە لەسەر بنەمای گۆرینی دیمۆگرافی دەوڵەمەندی پر نەوتی کەرکوك وا دەکات کە کورد بەرەوە سەربەخۆیی بەرێت لە کاتێکدا هەموو کوردێك لە قوڵایی دڵەوە ئومێدی بۆ دەخوازێت، کورد پێی وایە بەبێ کەرکوك، دەبێت بە پشتبەستن بە دراوسێکان حوکمی وڵاتەکەیان بکەن. بەڵام بە کەرکوك‌و کێڵگە نەوتییەکانییەوە دەتوانن ببنە خاوەنی ئابوورییەکی پتەوو سەربەخۆیی سیاسی دەستەبەر بکەن. بە گوێرەی ئەم دەستوورەی ئێستا، کورد شەریکەبەشی کێڵگە نەوتییەکانی کەرکوکە لەگەڵ حوکمەتی فیدراڵ بەڵام لە نەبوونی دەسەڵاتێکی بە هێزی حکومەتێکی ناوەندی یان لەئەنجامی روودانی شەری مەدەنی لە عێراق، ئەگەری ئەوە هەیە کە کەرکوك بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی کوردەکان.

کورد پێدادەگرێت کە ئەو ناوچانەی داوای دەکەن (شەنگال، تەلەعفەر، زەمارو شێخان) لە بەشی رۆژهەڵاتی موسڵ‌و (مەخمورو توزخورماتووو کفری‌و خانەقین‌و مەندەلی)، هەموو ئەو ناوچانە گرنگی بوونی نەوتی یەدەگییان هەیە سەرەرای ئەوەش کە دانیشتووانی جیاجیاشیان تێدا نیشتەجێن‌و لە هەردوو روانگەی مێژوویی‌و دیمۆگرافیشەوە کوردن‌و لەلایەن رژێمی پێشترەوە سیاسەتی بە عەرەبکرنیان بە سەردا سەپێنرا بوو.

لە کاتی گفتوگۆکانی ساڵی (٢٠٠٥)دا سەبارەت بە دەستوور، سەرکردە کوردەکان نەخشەیەکی سنوورەکانی هەرێمی کوردستانیان پێشکەش کرد کە تیایدا تەلەعفەر کە شارو ناوچەیەکی رۆژهەڵاتی موسڵە بە ناوچەی پێکەوە ژیانی مێژوویی خاکی کوردستانی ناو دەبەن‌و سەرەرای ئەوەی کە زۆرینەی دانیشتووانەکەی لە نەتەوەی تورکمانن‌و لەوانەیە ئەم داواکارییە لەو پێویستییەوە سەرچاوەی گرتبێت کە هەلی پێکەوەلکانی شەنگال لە هەولێرەوە نزیکتر بوو بێت؟ لە راستی دا، کورد بە دوای دەست بە سەرداگرتندا ناگەرێت بەڵام مەبەستی گێرانەوەی هەموو ئەو ناوچانەیە بۆ سەر هەرێمی کوردستان. بۆ نموونە رێککەوتنی یەکگرتنەوەی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٦)دا ئەوە دەخاتە روو کە: ئێمە دەبێت دەستکەوتە مێژووییەکانمان بپارێزین‌و مافەکانمان بخەینە روو بە گێرانەوەی کەرکوك‌و خانەقین‌و شەنگال‌و مەخمورو هەموو ناوچە بە عەرەبکراوەکانی تر بۆ باوەشی هەرێمی کوردستان.

**ب. خوێندنەوەی تورکمان سەبارەت بە پرسی کەرکوك:**

بە پێی ووتەی تورکمانەکان، ویلایەتی موسڵ ناوچەیەکی کوردیو عەرەبی یان تێکەڵ نەبووە بەڵکو ویلایەتێکی تورکمان بووە. تورکمانەکان پێیان وایە کەرکوكو شارو شارۆچکەکانی تری تێکەڵ لە دانیشتووان (بۆ نموونە کفری، دووزخورماتوو، تازەخورماتوو، ئاڵتون کۆپری، تەلەعفەر) شاری رەسەنی تورکمانن‌و لە پەنای ئەوان کۆمەڵەو نەتەوەکانی تریشی تیادا ژیاون، هەرچەندە لەم پشتێنەیەدا ژمارەیەك گوندی تورکمان (بۆ نموونە، گوندی بەشیر) هەن بەڵام تورکمانەکان بەوە ناسراون کە گرووپێکی شارستانین ولە سەردەمەکانی سەلجوقی و عوسمانییەکانەوە وەك سەربازو کادری کارگێڕیو پیشەزان کۆچیان کردووەو هاتوونەتە ناوچەکە. تورکمانەکان هەندێ جار بەشێوەیەك رایدەگەیەنن کە کەرکوك شارێکی تورکمانییەو تورکمانی بوونی بۆ سەدان ساڵ دەگەڕێتەوە.

تورکمانەکان بوونی بە هێزو زۆرینەی کورد لە ناوشاری کەرکوك بۆ ئەوە دەگێڕنەوە کە لە دوای ساڵی (١٩٢٧) و دۆزینەوەی نەوت کۆچیان کردووەو هاتوونەتە شارەکە لەلایەکی ترەوە دەڵێن تورکمانەکان یەکەم قوربانی بە عەرەب کردن بوون‌و مەینەتی زۆریان بینیوە لە زەوتکردنی زەویو زارو دوور خستنەوەیان لەکارو سیاسەتداو تاکە رێگەی خۆدەربازکردنیان تەنها خۆ تۆمارکردنیان بووە بە عەرەب. تورکمانەکان ئەوە رەتدەکەنەوە کە تەنها کوردەکان یەکەم قوربانی دەستی رژێمەکانی پێشتر بووبن‌و دەڵێن کوردەکان لە ساڵی (١٩٢٠)ەوە دژی هەر حکومەتێکی عێراق دەوستانەوە هەر لە سەردەمی مەلەکییەوە بە هەموو رژێمەکانی تری ئەو کاتەوەو هەروەها کورد بەوە تاوانبار دەکەن کە هەوڵیانداوە بۆ بە کورد کردنی کەرکوك لە سەردەمی کۆتایی حوکمی مەلیکدا.

تورکمانەکان لە دوای ئەنجامی شەڕی ساڵی (٢٠٠٣)یەوە بە ئاشکرا دژی گەڕانەوەی ئاوارە کوردەکان وەستانەوە بۆ ناو کەرکوكو داوایان دەکرد کە ئەو ژمارەیەی گەڕاونەتەوەو نیشتەجێ بوونەتەوە بۆ کەرکوك زۆر زیاترە لەوەی کە پێشتر دەرکراون‌و بەشێکی ئاوارە گەڕاوەکان ئەو کوردانەن کە لە شارەکانی تری هاوسێی کەرکوکەوە هاتوون بۆ ناو کەرکوك.

کورد بەوە تاوانبار دەکەن کە دەست بەسەر زەویو زاریان دا دەگرن‌و ئەمەریکاش هاوکاری کوردەکان دەکات وەك سزایەك بەرامبەر تورکمانەکان بە هۆی ئەوەی تورکیا رێگەی ئەمەریکای نەداوە لە ئازاری ساڵی (٢٠٠٣)دا هێزەکانیان خاکی تورکیا لە دژی عێراق بە کاربهێنن.

تورکمانەکان داواکاری کورد بۆ زاڵ بوون بەسەر نەوتی کەرکوك رەت دەکەنەوەو دەڵێن نابێت کەرکوك بە هەرێمی کوردستانەوە بلکێندرێت بەو بیانووەی کە کەرکوك هیچ کاتێك بەشێك نەبووە لە کوردستان‌و هەروەها نایانەوێت کەرکووك لە ژێر دەسەڵاتی حوکمەتی ناوەندیش بمێنێتەوە بەڵکو خوازیاری حوکمێکی تایبەتن بۆ پارێزگای کەرکووك وەك هەرێمکی فیدراڵی. تورکمانەکان داواکاری کوردەکان بۆ ئەو ناوچانەی کە بە ناوچەی خۆیان دادەنێن رەتدەکەنەوەو پێیان وایە ئەو ناوچانە ناوچەی مێژوویی تورکمانن وەك ناوچەی تەلەعفەر.

موزەفەر ئەرسەلان، راوێژکاری سەرۆك جەلال تاڵەبانی بۆ کاروباری تورکمانی، ئەوەی خستووەتە روو کە کوردەکان دەیانەوێت دیمۆگرافیای تەلەعفەر بگۆڕن. بۆ زاڵ بوون بەسەر بازرگانییەیەکەیو دەست بە سەرداگرتنی نەوتو سەرچاوە کانزاییەکان‌و کردنەوەی رێگەیەك لە تەلەعفەرەوە بۆ شەنگارو ناوچە کوردییەکانی تری سنووری سوریا. هەروەها ووتی: (کوردەکان بە هەمان مەبەستو هۆکار داواکای کەرکوكو موسڵو توزخوزماتووو تەلەعفەریش دەکەن‌و ئەگەر بۆیان بلوێت دەیانەوێت دەست بگرن بەسەر زۆربەی ناوچەکانی ترو بیخەنە سەر شاری خەونەکان)، ئاماژەیەکی کۆنی تورکمانەکان بۆ هەرێمی کوردیو دەڵێن رۆژێك دادێت کە کوردەکان داوای بەغداش دەکەن چونکە ئەوانە ئێستا حاکمی راستەقینەن لەوێ.

**ج. خوێندنەوەی عەرەب سەبارەت بە پرسی کەرکوك:**

عەرەبە رەسەنەکان بەشێوەیەکی سەرەکی لە سێ خێڵی کۆچەری پێکهاتوون کە ئەوانیش خێڵە کۆچەرییەکانی عوبێدو جبورو حەدیدن. عەرەبەکان زاڵن بەسەر ناوچە لادێیەکانی رۆژئاوای شاری کەرکوكو هەروەها بەسەر رۆژئاوای خودی شارەکەشدا زاڵن (بۆ نموونە گەرەکی حەدیدییەکان)، بەپشت بەستن بەکاری جوتیاری لەگەڵ خەڵکانی وەك کوردەکاندا شەریکەبەش بوون لە لەوەڕگاو پاوانی ناوچەکەدا. زۆرێك لە عەرەبە رەسەنەکان، سیاسەتی فراوانکردنی بە عەرەبکردن‌و سروشتی جینۆسایدی ئەنفال کە زیاتر لە (١٠,٠٠٠)دە هەزار کوردیان کە زۆربەیان خەڵکی شاری کەرکوك بوون لە ساڵانی نەوەدەکانەوە ساڵی (١٩٩٠) ئاوارەکردن.

بۆ نموونە سەرکردەی گرووپێکی عەرەب بە ناوی (عەبدولرەحمان مونشد ئەلعاسی) رایگایاند: (ئێمە لەلایەن ئەو کەسانەی کە سەدام ناچاری کردبوون‌و دەربەدەرکرابوون. ناچارنەکراوین‌و فشارمان نەخراوەتە سەر بۆ دەرکردن بەڵام لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٩١ – ٢٠٠٣)دا رژێم (١١,٨٥٦) یانزە هەزارو هەشت سەدو پەنجاو شەش کەسی کوردی لە پارێزگای کەرکوك دەرکرد)، ئەو کەسایەتییە عەرەبە درێژەی بە قسەکانیداو ووتی: (لە روانگەی عەرەبەکانەوە، کەرکوك هەرێمێکی فرە نەتەوەو تێکەڵەو رێگە نادەن سەربەهەرێمی کوردستان بێت بەڵام دەکرێت لە ژێر کۆنترۆڵی راستەخۆی حکومەتی ناوەندی یان وەك هەرێمێکی تایبەتی فیدراڵی بمێنێتەوە). سەرکردەیەکی عەرەبی جەختی لەسەر سروشتی پێکەوە ژیانی دانیشتووانی کەرکوك کردەوەو ووتی:

(پەیوەندیو هاورێیەتییەکی زۆر لەنێوان پێکهانەکاندا هەیە. سەیری من بکەن کە من خۆم عەرەبی سوننەم لەبەر ئەوەی باوکم عەرەبی سوننەیە بەڵام دایکم عەرەبی شیعەیەو خێزانەکەم تورکمانەو خۆم ژنێکی کورد شیری داوەمەتێ ئەوا من پێش هەموو شتێك کەسێکی عێراقیم‌و ئەگەر کوردێك

بکوژم ئەوا خاڵەکەم دەکوژم، ئەمەیە کەرکوك و ئەوەی ئێستا تۆ بە دوایدا دەگەڕێی، ئەم جیاوازیانەن، ئەمانە هەموویان جیاوازو نامۆن بۆ کەرکوك بەڵام ئەمە دیاردەیەکی سیاسییەو لەگەڵ کات و ساڵ دەڕوات و نامێنێت).

ئەو عەرەبانەی کە لەلایەن ڕژێمەکانی پێشووەوە جێگیر کرابوون و هێنرابوونە کەرکوك زۆربەیان موسولمانی شیعە مەزهەبن و خۆیان بە نیشتەجێی کەرکوك دەزانن، بەڵام هەندێکیان بە ئاشکرا رایانگەیاندووە کە لەوانەیە لە ژێر فشاری کوردەکانەوە کە ئەگەر قەرەبوو بکرێنەوە ئەوا دەگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی پێشووتری خۆیان و شاری کەرکوك بەجێ دەهێڵن. زۆرێکیان ئەوە ڕەتدەکەنەوە کە بە کرێگراوی ڕژێم بووبن و دەڵێن: ئێمەش قوربانی دەستی کارەکانی ڕژێم بووین و بەزۆر ناچار کراوین کە شوێنی ڕەسەنی خۆمان جێ بهێڵین و خزمەتی مەرامی سیاسەتی بە عەرەب کردنی شارەکە بکەن. هەندێکی تر لە عەرەبەکان دەڵێن: ئێمە بۆ ئەوەی کارمان دەست بکەوێت هاتینە کەرکوك لەبەرئەوەی هەلی کارکردن هەبووە لە کەرکوك. هەندێکی تر بەتایبەتی نەوەو گەنجەکانی عەرەبە هاوردەکان دەڵێن: ئێمە شوێنی ڕەسەنی خۆمان نییە کە بتوانین بگەڕێینەوەو خوازیارن کە شاری کەرکوك لە ژێر کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی حوکمەتی ناوەندیدا بمێنێتەوەو دەڵێن: کەرکوك ناوچەیەکە کە هەموو کەس حەز دەکات تیایدا بژێت. سەرکردەیەکی ناو خۆی عەرەب وتی: چارەسەری کەرکوك ئاسانە بە ئەنجام بگات کاتێك کە حوکمەتی ناوەندی بڕیار بدات کە کەرکوك بە شارێکی عێراقی بمێنێتەوەو ئەو کاتە ئەو حیزبەو لایەنانەی خوازیاری پێچەوانەی ئیرادەی ئێمەن دەبێت دەمیان داخەن.

**د. خوێندنەوەی کریستیانەکان سەبارەت بە پرسی کەرکوك:**

کریستیانەکان بە ئاشووری و کلدان و سریانییەکانیاوە، ڕەسەنایەتی خۆیان لە کەرکوك دەگێڕنەوە بۆ سەردەمی (پێش- کریستیان) ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییەکان. لەگەڵ ئەوەشدا کە کریستیانەکان گرووپێکی بچووکن لە کەرکوك بە پێی ئامارێکی مەزندە کراو لە ساڵی (٢٠٠٦)دا بە (١٢,٠٠٠) دوانزە هەزار کەس ئەژمار دەکرێن، لە ڕوانگەی ئەوانەوە هەموو کۆمەڵەکانی تری کەرکوك مشەخۆرن و خۆیان هەڵقورتاندوتە نێو کاروباری کەرکوك و داواکارییەکانیان بە هەند وەرناگیرێن و ئازارو مەینەتی زۆریان چەشتوە لە دەست دەستبەسەردا گرتنی موڵك و ماڵیان لەلایەن هەردوو نەتەوەی کوردو عەرەبەوە.

کریستیانەکان پێیان وایە هەر چەندە لابردنی ڕژێم هەلی کارکردن و ماف خوێندنی سریانی بەوان بەخشی بەڵام لە هەمان کاتدا گرووپی ئاژاوەگێڕو سەلەفی بە هێز کردو ئەو گرووپانەش پێیان وایە کریستیانەکان کافرن و بێ بڕوان. کریستیانەکان ئەو گرووپانە بەوە تاوانبار دەکەن کە لەپشت تەقاندنەوەی کەنیسەکانیانن و ترسی زۆریان هەیە کە لە ئەنجامی ململانێی گرووپەکان لەسەر کەرکوك ئەم کارانە لە بەرزبوونەوە دابن. بە پێی وتەی سەرکردەیەکی ئاشوورییەکان: (سەبارەت بە ئێمەی ئاشوورییەکان هیچ کێشەیەك لە ئارادا نییەو هیچ فشارێکیش نەخراوەتە سەر ئێمە لە کەرکوك). هەروەها وتی: (بەڵام ئێمە پەیوەندی ڕاستەوخۆمان هەیە بەکێشەکانەوە چونکە ئەگەر لێرە قەیرانێك هەبێت ئەوا هەموو کەسێك باجی ئەو کێشەیە دەدات)و سیاسەتمەدارێکی ناوخۆی ئاشوورییەکان هۆشداری ئەوەی داو وتی: ئێمە هەموومان خۆمان چەکدار کردووەو ترسمان هەیە چونکە قسە لەوە دەکرێت کە شەڕی ناوخۆ ڕووبدات و لە وانەیە شتێکی بچووکیش هۆکار بێت و ببێتە هۆی دەست پێکردنی شەڕەکە).

جەلال تاڵەبانی ڕایگەیاند وتی: (کاتێك کە نەشتەرگەرییەك ئەنجام دەدەیت دەبێت زۆر ووریا بیت بەڵام ئێمە لە کەرکوك قسە لەسەر نەشتەرگەری مێشك دەکەین. لەوانەیە ئەگەر پیاوێکی کورد دەست بۆ ژنێکی عەرەب درێژ بکات یان هەر بە پێچەوانەوە ئەوا ببێتە هۆی ئەوەی کە ئاگر لەنێوانیاندا بکەوێتەوە یان هەر توورە کردنێك بە بەرز کردنەوەی ئاڵای کوردستان لە گەڕەکە عەرەبەکان ئەو شەڕە دروست ببێت. لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکانێك هەن کە ئەهلی خێرن و ئامادەن بۆ هێور کردنەوەی بارودۆخەکەو پێویستە ئەو جۆرە خەڵکانە لە دەسەڵاتدا بن بۆ ئەوەی بتوانن بەو کارانە هەستن بەڵام ئەو کەسانە دوورن و لە دەسەڵاتدا نین).

*** کەرکوك و قۆناغی گوێزانەوەی سیاسی عێراق:**

**أ. بەکارهێنانەکانی دەسەڵاتی نوێی کورد:**

دوو پارتە سەرەکییە کوردییەکان، KDP وPUK، لەگەڵ دەرپەڕاندنی ڕژێمی بەعس وەك بە هێزترین ئەکتەری سیاسی نێو پارتەکان، دەرکەوتن وەك دوو پارتی ڕێکخراوو خاوەن پشتگیری گەورە لەلایەن خەڵکی کوردستان و ئەمەریکاو بەشێوەیەك بەرنامەی کاری خۆیان ڕێکخستووە کە دەزگا کاتییەکان خۆیان بە کادیری لێهاتووی حیزبەکانیان سپاردووەو هەردوو سەرکردەکانیان، مەسعود بەرزانی و جەلال تاڵەبانی، ئەندام بوون لەو (٢٥) بیست و پێنج ئەندامە کاتییەی ئەنجوومەنی حوکم کە ماوەی کەمتر لە ساڵێکی خایاند لە تەمووزی ساڵی (٢٠٠٣) بۆ حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٤) بۆ ئەوەی کاریگەرییان هەبێت لەسەر دارشتنی دەستووری کاتیی عێراق. لە سەرەتایی ساڵی (٢٠٠٤)دا مادەی (٥٨)ی پەنجا و هەشتی (یاسای کارگێڕی گواستنەوە) کە باس لە سڕینەوەی ئاسەواری سیاسەتی بە عەرەب کردن دەکات هەروەها مادەی (١٦ج ) ماف بەکارهێنانی دەسەڵاتی ڤیتۆی بەسەر دەستووری دائم دا، داوەتە کوردەکان.

لەسەروبەندی هەڵبژاردنە گشتییەکانی کانوونی دوومی ساڵی (٢٠٠٥)دا، دەسەڵاتی پارتەکان بە شێوەیەکی وا بەهێز دەرکەوتن کە نەدەتوانرا لە بەرچاو نەگیرێن بۆ سەرخستنی قۆناغی گواستنەوەکە هۆکاری سەرەکی بوون بۆ بەرهەڵستی کردن بۆ بە دەستهێنانی مافەکان لە حکومەتی کاتیی دا. لە دوا ساتی مشتومڕی بڕیارداندا، سەرکردایەتی کورد بەوە ڕازی بوون کە بەشداری حکومەتی کاتی بکەن بەو مەرجەی کە کوردە ئاوارەکانی کەرکوك کە لە سلێمانی و هەولێر دەژین بەشداری لە هەڵبژاردنەکانی پارێزگای کەرکوك بکەن و

ماڤی دەنگدانیان هەبێت. ئەم بڕیارە بووە هۆی کشانەوەو بەشداری نەکردنی عەرەبە سوننەکان لە هەڵبژاردنەکان و ئەمەش دەسەڵاتی کوردەکانی بە هێزتر کرد ئەویش بە پڕکردنەوەی شوێنی نوێنەرەکانیان لەسەر ئاستی دەوڵەتی و ناوخۆی کەرکوك و هێزێکی تری دایە کێشەی کەرکوك.

لە چاوپێکەوتنەکانی هەندێ لە بەرپرسە باڵاکانی PUK و KDP لە کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥)دا، ساڵێك بەر لە هەڵبژاردنەکان، ئەوەیان راگەیاند کە کورد دەیەوێت کێشەی کەرکوك لەچوارچێوەی دەوڵەتی عێراقدا چارە سەر بکرێت و ئەوەیان دەخستە روو کە ئامادەی هەر روو بە رووبوونەوەیەکن بۆ چارەسەری کێشەی کەرکوك. لەگەڵ ئەوەشدا دوا بەدوای هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠٠٥) هەڵویستەکان لەسەر دانانی پۆستەکان لە کەرکوك ئاڵۆزو سەختربوون.

حاڵەتی تایبەت بۆ چارەسەری کێشەی پارێزگای کەرکوك تەنها بۆ ماوەی قۆناغی کاتی گوێزانەوە جێگەی رەزامەندی کورد دەبێت و نابێت بەشێك بێت لە چارەسەری جێگیرو پێویستە دوای ئەو قۆناغە چارەسەری تری بۆ بدۆزرێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، نەوشیروان ئەمین جێگری جەلال تاڵەبانی سکرتێری گشتی (PUK)، لە ئاداری ساڵی (٢٠٠٥) دا لە چاوپێکەوتنێکی دا ئەوەی روونکردەوە کە لە کانوونی دووەمی (٢٠٠٤)دا رایگەیاند بوو سەبارەت بە چارەسەری کێشەی کەرکوك کە خوازیارە حاڵەتێکی تایبەت بۆ کەرکوك لە شێوەی ئەوەی (Brussels) لە دەوڵەتی بەلجیکا بدۆزرێتەوەو ئەوەی خستە روو کە ئەم حاڵەتە دەبێت تەنها لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا رووبدات و دەبێت کەرکوك بە هەرێمی کوردستانەوە بلکێندرێت نەك وەك پایتەخت بەڵکو وەك دەسەڵات دابەش کردنێکی رێکخراوی دەست نیشان نەکراو بەدڵنیاییەوە نابێت وەك حاڵەتێکی تایبەت لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان سەیر بکرێت.

سەرکردە کوردەکان لە ساڵی (٢٠٠٥) لەسەر بنەمای هێزی هەڵبژاردن، دەستووریان دارشت و بە ریفراندومێکی جەماوەری لە (١٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٥)دا دەنگی لەسەر درا. دەسکەوتی کورد لە هەردوو گفتوگۆی سیاسی و دەستووری گەیشتە ئەو ئاستە بەرزەی کە ببێتە هۆکارێك بۆ بەرقەراربوونی ئاشتی، ئەویش بە فراوانکردنی سنووری ناوچەکانیان و هەروەها بە هێز کردنی دەسەڵات و گەیشتن بە سەرچاوە سروشتییەکان. سەرکەوتنی ستراتیجیەتێکی لەم جۆرە خۆی لە فەراهەم کردنی ئاشکرای مادەی (١٤٠)ی دەستووردا دەبینێتەوە کە خشتەیەکی دارشتووە بۆ چارەسەری کێشەی کەرکوك. سەرەرای ئەوەش ماددەی (٥٣)ی یاسای گوێزانەوە کە رێگر بوو لەبەردەم کەرکوك بۆ ئەوەی بکەوێتەوە سەر هەرێم، لەم دەستوورە نوێیەدا لابردراو هەڵوەشایەوە، ئەم لابردنەش رێخۆشکەر دەبێت لە بەردەم کەرکوك بۆ ئەوەی بە ریفراندۆمێکی جەماوەری بکەوێتەوە سەر هەرێمی کوردستان.

بە سەرکەوتنی کورد لە هەڵبژاردنەکەدا بوار رەخسا کە لە ئەنجومونی پارێزگادا کورد گۆرانێکی دیارو بەر چاو لە دیدی سیاسەتی ناو خۆی کەرکوکدا بەدەست بهێنێت و لیستەکەیان توانی بەرێژەی (٥٩,١٩٪)ی دەنگەکان بەدەست بێنێت و زۆرینەی کورسی ئەنجوومەن بۆ خۆی بباتەوە بە (٢٤) کورسی لە سەرجەمی (٤١) کورسی ئەنجوومەنی پارێزگادا. لیستی سەرەکی تورکمانەکان، بەرەی تورکمانی عێراقی، بە پلەی دووەم هات کە (٨) هەشت کورسی بە دەست هێنا، گرووپی کۆماری عێراقی و عەرەبە سوننە سیاسییەکانی بەگشتی (٥) پێنج کورسییان بەدەست هێنا. (٢) دوو کورسی بە گرووپێکی هاوپەیمانی بچووکی توورکمانی کەوتن و هەریەك لە هاوپەیمانی ئیسلامی و تورکمانی و لیستێکی عەرەبی و گرووپی نیشتیمانی عێراقی بەرێژەی (٣٪) لە سەدا سێ دەرکەوتن. جێگای سەرسورمانە کە هیچ پارتێك جگە لەسەر بنەمای ئەتیکی لەسەر هیچ بنەمایەکی تر پێشکەوتنێکیان بەدەست نەهێنا.

سەرکەوتنی کورد لە کەرکوك بە یارییەك درایە قەڵەم ئەوەك وەك توانایەك بۆ پەیرەوکردنی سیاسەتی دروست. هەر زوو ئەندامانی ئەنجومەن دەست بەکاربوون و یەکەم کۆبوونەوەیان ئەنجامداو لە جیاتی کەمکردنەوەی ئازارەکان توندو تیژی بەرەو خراپتر رۆیشت و سووربونی کوردەکان لەسەر بەکارهێنانی زمانی کوردی بەبێ وەگێران بۆ زمانی تر وای کرد کە ئەندامانی تری ئەنجومەن هۆڵی ئەنجوومەن بە جێبهێڵن. لەگەڵ ئەوەشدا، پۆستە سەرەکییەکان بەبۆشی مانەوەو پرنەکرانەوە لە کاتێکدا ماڤ کوردەکان بوو کە پارێزگار دابمەزرێنن بەڵام سیاسییەکانی عەرەب و تورکمان سووربوونی خۆیان نیشان دەدا کە ئەگەر جێگری پارێزگارو سەرۆکی ئەنجوومەنی پارێزگا نەدرێن بەوان ئەوا بایکۆتی کۆبونەوەکان دەکەن و ئامادەی کۆبوونەوەکان نابن. دوای ئەوەی وادەی پڕکردنەوەی پۆستەکان کۆتایی هات کە بۆیان دیاریکرابوو، عەرەب و تورکمانەکان رازی بوون کە پۆستی جێگری پارێزگار وەربگرن بەڵام لە نێو خۆیاندا رێکنەوتبوون کە بۆ ئەو پۆستە کێ دابنرێ و شوێنەکە پڕ بکاتەوە. هەرچەندە دوای گەرانەوەیان بۆ ناو ئەنجوومەنی پارێزگا بەشداریان دەکرد لە گفتوگۆکانی ئەنجوومەندا بەڵام لەکاتی دەنگداندا خۆیان ون دەکرد بۆ ئەوەی شەرعیەت نەدەنە ئەنجامەکان. بەم شێوەیە کورد بە تەنها مایەوە کە بە یەکلایەنە بگاتە بڕیارەکان و بەم جۆرەش توندو تیژیی ئەتنیکی زیادی کردو ئەستەم بوو کە کارەکانی بە ئاسانی جێ بە جێ بکرێن. لەم ماوەیەدا پارتە کوردییەکان توانییان سەرکەوتوانە کۆنترۆڵی هێزەکانی ئاسایش و سوپا و پۆلیس و کاری هەواڵگری شاری کەرکوك بەرێوەبەرن.

بە هەمان شێوە، کوردەکان توانیان زاڵ بن بەسەر خزمەتگوزارییە مەدەنییەکانی شارەکەو خەڵکی دڵسۆزی خۆیان لە پۆستە سەرەکییەکان دانا و مووچەیان لە دەرەوەی بوودجەی حکومەتی هەرێمی سلێمانی و هەولێر پێ دەدان و ئەمەش وایکرد کە جیابوونەوە لەنێوان کوردەکان و نەتەوەکانی تر رووبدات و بگاتە ئەو هەڵوێستەی کە کاری تێکدەرانەی چەکداری و ئەنجامدانی تاوانکاری زیاتری لێبکەوێتەوە.

بۆ پێداگیری لەسەر داواکارییەکانیان سەبارەت بە شاری کەرکوك دەبوایە کوردەکان چەند رێگایەکی ستراتیژییان بگرتایەتە بەر وەك:

١. بەکارهێنانی دەسەڵاتی سیاسیو دامەزراوەیی لەسەر ئاستی نیشتمانی لە رێگەی بریارە کارگێرییو یاساییەکانیان بەمەبەستی گێرانەوەی کەرکوك بۆ سەر هەرێمی کوردستان. نوێنەرانی باڵای حکومەتی نیشتمانیی ئەوەیان دووپات کردەوە کە سیاسەتمەدارانی کورد دەتوانن سوود لەو ئالیەتە یاساییانە وەربگرن کە ووتوێژیان لەسەر کراوە وەك یاسای کارگێری کاتیی بۆ ئەوەی یاساو رێسای نوێ دروست بکەن وەك ماددەی (٥٨) کە تایبەتە بە داواکاری کوردەکان سەبارەت بە کەرکوكو بەهەمان شێوە کوردەکان ئارەزوو دەکەن کە ماددەی (١٤٠)ی دەستوور بەکاربهێنن بۆ رێکخستنی ئامارو ریفراندۆم لە شاری کەرکوكو ناوچەکانی تری کە داوای دەکەن ئەمەش دەبێت پێش کۆتایی هاتنی ساڵی (٢٠٠٧) جێبەجێ بکرێت.

٢. بەرزکردنەوەی زۆرترین داواکاری لە سەرەتای وتوێژەکاندا بۆ ئەوەی پشکی دیارو کۆتایی بە دەست بهێنرێت. داواکارییەکانیش لە نووسینەوەی دەستووردا ئەمانە دەگرێتەوە: دەسەڵاتی تەواوی خاوەنداریەتی کورد بەسەر سەرچاوەی نەوتو گاز لە چوارچێوەی هەرێمەکەیاندا بە پاراستنی مافی ناردنە دەرەوەشیانەوە، بەڵام مەسەلەی دابەش کردنی دەسکەوتەکان بۆ وتوێژ جێ بهێڵرێت، هەروەها داوای بودجەی سەدا بیستو پێنج (٢٥٪) بکرێتو جێگیر بکرێت، کۆنترۆڵی سیاسەتی دارایی هەرێم بکرێت، پۆستە سەرەکییەکانی پارێزگاکان، بەرێوەبەرانی پۆلیس، رێکخستنەوەی سنوورەکانی هەرێم بۆ لکاندنەوەی ناوچەکان بەو شوێنانەی کە دانیشتووانی کوردی تێدا زۆرە، پاراستنی هێزەکانی پێشمەرگە، بەکارهێنانی دەسەڵاتی (ڤیتۆ) لە دژی هاتنە ناوەوەی هێزەکانی سوپای عێراق بۆ ناو هەرێم، هەندێك لە داواکارییەکان جێبەجێ کران لەوانە: خاوەنداریەتی بەسەر سەرچاوە نەوتیو گازییەکانو دەسەڵاتی دامەزراندنو پارێزگاری کردنی هێزەکانی پێشمەرگە، هەندێکی تریش گۆرانکارییان تێداکراوە یان لابران. بودجە بەرێژەی سەدا حەڤدە (١٧٪) جێگر کراو حکومەتی فیدراڵ لە ژێر کۆنترۆڵی سیاسەتی تایبەتدا دەبێتو مەسەلەی دەسەڵاتی بە کارهێنانی (ڤیتۆ)ی هەرێم سەبارەت بە هاتنە ناوەوەی هێزی سوپای ناوەندی بە چارەسەر نەکراووی مایەوەو رێکخستنی سنوورە سەرەکییەکان دواخرا بەڵام خشتەو میکانیزمەکان خرانە چوار چێوەی ماددەی دەستووری (١٤٠)ەوە.

٣. هەرەشە کردن بەوەی ئەگەر داواکارییەکانی کورد جێبەجێ نەکرێن، ئەوا جەماوەری کوردستان وەك سەرکردەکانیان ناکەنو داوای سەربەخۆیی دەکەنو سەرکردەکانی کورد ئەوەیان دووپات کردەوە کە جوڵانەوەی ریفراندۆم بوونی هەیەو ئەمەش بەڵگەی ئەو مەترسییەیە کە داوای سەربەخۆیی بکەن.

جووڵانەوەی ریفراندۆم لەلایەن هەردوو پارتی (PUK)و (KPD) دامەزرێندراوون بۆ ئەوەی زامنی هەرێمی فیدراڵی کوردستانی پێ بکەن ئەویش لەسەر بنەمای فەلسەفەی: ئەگەر سەد (١٠٠) دۆلارت بوێت داوای (٢٠٠) دوو سەد دۆلار بکە، ئازاد شێخانی لێکۆڵەرەوەیەکی کوردە رایگەیاندو ووتی: عەرەبەکان تەنانەت بە فیدراڵیزمیش رازی نین (وەك ئەوەی کە کورد داوای دەکات)، کەواتە دەبێت هەرەشەی ریفراندۆم لەسەر سەربەخۆیی بمێنێت.

٤. رێککەوتنی (PUK)و (KPD) خەونی هاوبەشی هەردوو پارتەکەیە سەبارەت بە هەرێمی کوردستان لە چوارچێوەی عێراقێکی فیدراڵو هەنگاونانی زیاتر بۆ بەرقەراربوونی ئاشتیو یەکخستنێکی تەواو بۆ هەردوو حکومەتی هەرێمی هەولێرو سلێمانی چونکە لە پرۆسەی گفتوگۆکانی دەستوور دانانداا سەرکردە کوردەکان بۆیان دەرکەوت کە تەنها بەرەی هاوبەش دەتوانێت فیدراڵیزم دەستەبەر بکات وەك بنەمایەك پتەو بەرەو گێرانەوەی کەرکوك بۆ هەرێمی کوردستان. ئەم دواخستنە یەك لە دوای یەکانەی یەکخستنی هەردوو ئیدارەی کوردییەکان وایکرد کە بەرەی دژە کورد بڵێن ململانێی نێوان (PUK)و (KPD) بەڵگەی ئەوەیە کە کوردەکان تەنانەت شایستەی بەرێوەبردنی هەرێمەکەی خۆشیان نین. یەکگرتنەوەی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ئایاری ساڵی (٢٠٠٦)دا تەنها شتێکی سەرەتایی ناکامڵ بوو بەڵام هەڵوێستو دیسلپینی پتەوی پارتیو یەکێتی لە کاتی گفتوگۆکانی دارشتنی دەستووردا زامنی بەڵگەنامەیەکی گەورەی کرد بۆ بەرژەوەندییەکانی هەردوولایان.

٥. برەودان بە هاوپەیمانیو نزیکی لەگەڵ ئەمریکا و بەریتانیا دەبێت بە پێوەری دڵسۆزیو پاداشت بدرێتەوەو ئەمەش بە هاوبەشیو هاوکاریکردنی هێزەکانی ئەمریکا دەبێت لە دژی چەکدارە توندرەوەکان، بە شاری کەرکوکیشەوە بەم شێوەیە دەتوانن واشنتۆن قەناعەت پێ بکەن کە تەنها کورد دەتوانێت کاریگەری پاراستنو بەقەرارکردنی ئاشتی هەبێت لە کەرکوك دا.

٦. بە بەکارهێنانی هەڵمەتێکی رێکوپێك بەمەبەستی رازی کردنی نەتەوەکانی تری کەرکوك بەوەی کە مافەکانیان وەك کەمینە نەتەوەکان بە تەواوی دەپارێزرێت وەك ئەوەی کە سەرکردە کوردەکان دەیخەنە روو مافەکانی تورکمانەکانو کریستیانەکانو یەزیدییەکانو شەبەكو کەمینە نەتەوەکانی تر کە لە کاتی ئێستادا لە هەرێمی کوردەکان دا دەژینو مافەکانیان پارێزراون.

حاڵەتی تورکمانو کریستیانەکانی کەرکوك باشتر پارێزراو دەبوو لەوەی کە لە ژێر کۆنترۆڵی حکومەتی ناوەندی دا بمێننەوە. هەروەها ئەگەر بتوانین قەناعەت بە تورکمانەکان بکەین لەوەی کە گوزەرانیان باشتر دەبوو کە لە ژێر حکومەتی کوردی دا بژین نەوەك لە ژێر حکومەتی عەرەبەکان بەم شێوەیەش چارەسەری کێشەی کەرکوك ئاسانو گونجاو دەبێت. ئازاد شێخانی رایگەیاند: (ئەم کارە ئەرکی زۆر سەختی دەوێت)، پیرۆت تاڵەبانی کە پارێزەرێکی خەڵکی کەرکوکەو لەگەڵ (ی. ن. ك)ە پێشنیازی کرد کە لەگەڵ تێپەر بوونی کات نەتەوەکانی تر دەتوانن لە ژێر حوکمی کورد گوزەران بکەنو بە ئاسانی بژین.

**ب. هەنگاوی (ئاسایی كردنەوە):**

قۆناغی ئاسایی كردنەوە كلیلی بنچینەی ستراتیجیەتی كوردە بۆ ئەوەی بتوانێت بە شێوەیەكی ئاشتیانە كەركوك و ناوچەكانی تر بەدەست بهێنێتەوە و بلكێندرێنەوە بۆ هەرێمی كوردستان. ئەم هەنگاوە پرۆسەیەكە كوردەكان بە پرۆسەی ئاسایی كردنەوە ناوی دەبەن و بەسرینەوەی ئاسەواری بنەرەتی سیاسەتی بە عەرەبكردنی دادەنێن. ئەم چەمكە لە ماددەی (٥٨) پەنجا و هەشتی یاسای ئیدارەی كاتیدا باسكراوە و ئەم خاڵانەی تیادا هاتووە:

١. گەڕاندنەوەی دانیشتووانە دەركراوەكان بە قەرەبووكردنەوە یان پێدانەوەی موڵك وماڵی لە دەست چوویان.

٢. ئەو كەسانەی كە لەلایەن ڕژێمی پێشووترەوە لەو ناوچانەدا نیشتەجێ كراون، دەكرێت نیشتەجێ بكرێنەوە و لەلایەن دەوڵەتەوە قەرەبوو بكرێتەوە، یان پارچە زەوییەكی بدرێتی لە شوێنی نیشتەجی بوونی ئەو پارێزگایەی كەلێیەوە هاتووە، یان دەكرێت قەرەبوو بكرێتەوە بۆ ئەو تێچوونەی كە لە كاتی گواستنەوەی بۆ ئەو ناوچەیە خەرجی كردووە.

٣. پەیداكردنی هەلی كاركردن بۆ هاوكاری كردنی هەموو ئەوانەی كە لەبەر جیاوازی ڕەگەزی تووشی بێكاری بوو بوون.

٤. هەڵوەشاندنەوەی یاسای گۆڕینی باری نەتەوایەتی (كە لە شاری كەركوك پەیرەو كرابوو) بۆ فشار خستنە سەر كوردەكان كە ناسنامەی خۆیان بگۆڕن و ببن بە عەرەب لە كاتێكدا ئەگەر بیانویستایە زەوی بكڕن و سوودمەند بن لە خزمەت گوزارییەكان یان بۆ ئەوەی بتوانن خزمەتگوزاریی مەدەنی و هەلی كاركردن لە بواری نەوتدا بە دەست بهێنن.

٥. داوای ڕاسپاردەو ڕێنمایی بكرێت لە ئەنجومەنی سەرۆكایەتی كە چۆن دەستكاریكردنی سنوورە ئیدارییەكان كە لەلایەن ڕژێمی پێشتووترەوە گۆڕدراوە هەڵبوەشێندرێتەوە.

٦. دواخستنی چارەسەری هەمیشەیی بۆ ناوچە كێشەدارەكان تا هاتنی كاتی دەنگدان لەسەر دەستووری هەمیشەیی.

ئەو دەستوورەی كە لە ساڵی (٢٠٠٥)دا دەنگی لەسەر درا، هەموو برگەكانی لە خۆدەگرت بەڵام گرنگی زیاتری دەدا، بە بێ درێژەدان بە پرۆسەیەك كە تیایدا دەبێت حاڵەتی ئەو ناوچانە هێور بكرێتەوە، لە مادەی (١٤٠) بەندی دووەمدا هاتووە:

(بەرپرسیاریەتی دەكەوێتە سەر بەشی جێبەجێكار لە حكومەتی كاتیی كە مەرجدار كراوە لە ماددەی (٥٨)ی یاسای كارگێڕی دەوڵەتی عێراق بۆ ماوەی كاتیی و دەبێت فراوان بكرێت و ئەركی بكەوێتە سەر ئەستۆی دەسەڵاتی هەڵبژێردراوی جێبەجێكردنی بە پێی ئەم دەستوورە كە جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە دەبێت حاڵەتی ئاسایی كردنەوە و ئەنجادانی سەرژمێری و ریفراندۆم لە كەركوك و ناوچەكانی تری كێشەدار جێبەجێ بكات بۆ دەست نیشان كردنی ئارەزووی هاووڵاتیانی ئەو ناوچانە پێش (٣١)ی كانوونی یەكەمی ساڵی (٢٠٠٧)).

هەر چەندە ماددەی (١٤٠) باس لە ریفراندۆم ناكات یان ئەوە ناخاتە ڕوو كە چۆن هاووڵاتیان مەبەستەكانیان دەربڕن بەڵام دەبێت بە گەڕانەوە بۆ ماددەی (٥٨ C) سەیری ئەوە بكرێت كە دەڵێت:

(چارەسەری هەنووكەیی بۆ ناوچە كێشەدارەكان بە كەركوكیشەوە دەبێت یەكانگیربێت لەگەڵ بنەماكای دادپەروەریی بە لەبەر چاو گرتنی خواستی دانیشتووانی ئەو ناوچانە، ئەنجامەكە بەو شێوەیە كە دانیشتووانی ناوچەی كێشەدار دەبێت ئەو هەلەیان هەبێت كە دەنگ بدەن بۆ یەكلاییكردنەوەی بارودۆخی كەركوك لە عێراقێكی داهاتووی فیدرالدا).

لەگەڵ ئامادەكردن و دارشتنی ماددەكانی (٥٨)و (١٤٠) كورد فشاری خستووەتە سەر هاوكارە سیاسییەكان بۆ ئەوەی هەماهەنگ و یارمەتیدەر بن بۆ پرۆسەی (ئاسایی كردنەوە)ی كەركوك و شوێنەكانی تر. كورد سوورە لەسەر جێبەجێ كردنی ماددەی (٥٨) لەبەر ئەوەی بەڕای كورد بە جێبەجێ كردنی ئەم ماددەیە كورد دەتوانێت زۆرینەی هەبێت لەو ناوچانەی كە بە ناوچەی كوردی ئەژمار دەكرێن، كورد دەتوانێت هەموو ئەو ناوچانە بە ریفراندۆمێكی ئاسایی ناوخۆیی بلكێندرێنەوە بە كەركوك ئەویش لە ژێر ماددەی (١٤٠)دا.

بەرپرس لە (KDP) حەسیب ڕۆژبەیانی ڕایگەیاندو ووتی: (كاتێك كە قەزاكان بە شاری كەركوك دەبەسترێنەوە ئەوا دیارو ئاشكرایە كە كورد زۆرینە دەبێت لە كەركوك، ئەو كاتە خەڵكی كەركوك گێرانەوەی كەركوك بۆ باوەشی كوردستان هەڵدەبژێرن و حكومەتی ناوەندیش دەبێت بە بریارەكەیان ڕازی بێت).

هەوڵەكانی كورد دووچاری دژایەتییەكی توند بوونەتەوە لەلایەن عەرەب و توركمانەكانی كەركوك و هەروەها لەلایەن لایەنە عەرەبییەكانی ترەوە لە چوارچێوەی عێراقدا دژایەتی دەكرێت، هەندێك لەوانە كەسانی دیاری حكومەتی ناوەندین. هۆكارێكی گرنگی ڕەتكردنەوەی ئیبراهیم جەعفەری لە ساڵی (٢٠٠٦) كە كاندید بكرێتەوە بۆ پۆستی سەرۆك حكومەتی كاتی لە ساڵی (٢٠٠٥)دا، ئەوە بوو كە ئەوەك ئەو هیچی نەكرد بۆ ئاسانكاری كردن بۆ ئاسایی كردنەوەی باری كەركوك بەڵكو لە جیاتی ئەوە كۆسپی دەخستە بەردەم پرۆسەی ئاسایی كردنەوە. زۆربەی بریارەكانی ماددەی (٥٨) چەندین ئاڵۆزكاری گرنگ لە كاتی تەمییز كردندا دەهێنێتە كایەوە، بۆ نموونە لە كاتێكدا كە دەردەكەوێت كە بەرهەڵستییەكی كەم بەدیدەكرێت لە بۆچوونی هەموو ئەوانەی كە لە ماوەی سیاسەتی بە عەرەبكردندا دەركراون ماڧ گەڕانەوەیان هەیە كە بگەرێنەوە شوێنی خۆیان بەڵام بۆچوونی جیاوازو توند لەسەر ژمارەی كوردەكان و تا ڕادەیەكیش توركمانەكان هەیە سەبارەت لەوانەی كە لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە دوور خرابوونەوە. سیاسەتمەدارە عەرەب و توركمانەكان بە نیگەرانییەوە بەرهەڵستی ئەو ژمارەیەی كوردەكان دەكەن، عەلی مەهدی سادق ئەندامی هەڵبژێردراوی ئەنجومەنی

پارێزگا رایگەیاند کە:

(ئەو کوردانەی کە لە کەرکوك دەرکراون مافی گەڕانەوەیان هەیە بەڵام زۆر کوردی تریش هاتوونەتە شارەکە. ژمارەی دانیشتووان لە پارێزگای کەرکوك لە ساڵی (٢٠٠٣)دا (٨٥٠,٠٠٠) هەشت سەدو پەنجا هەزار کەس بوو بەڵام ئێستا (١,١٥٠,٠٠٠) یەك ملیۆن‌و سەدو پەنجا هەزار کەسە، ئایا ئەم (٣٠٠,٠٠٠) سێ سەد هەزار کەسە لە کوێوە هاتوون؟ باوا مەزەندە بکەین کە ئەم ژمارەیە دەکاتە (٥٠,٠٠٠) پەنجا هەزار خێزان بەڵام تەنها (١٠,٠٠٠) دە هەزار خێزان لە سەردەمی رژێمی پێشوو تر دەرکرا بوون کەواتە ئەو (٤٠,٠٠) چل هەزار خێزانە زیادانە لە کوێوە هاتوون؟ مەبەست لەو گفتویانەی کە رژێمی پێشوو دەیان هەزار کوردیان لە ساڵانی (١٩٨٠) لە ناوچە گوندنیشنەکانی کەرکوك دەرپەڕاند یان کوشتنیان، پەلامارێکە بۆ سەر ئەوانەی کە گوێ بەم حاڵەتە نادەن لەبەر ئەوەی لەلایەك بەشێکی زۆری ئو گوندنیشنانە لکێندرابوون بە پارێزگا دراوسێکانی کەرکوك وەك بەشێك لە سیاسەتی بە عەرەبکردن بەم شێوەیەش ئەو ناوچانە بە شێوەی رەسمی (فەرمی) سەر بە کەرکوك نەبوون).

زمانی ماددەی (٥٨) سەبارەت بە عەرەبە نیشتەجێ بووەکان لە کەرکوك‌و ناوچەکانی تر بەهەمان شێوە قابیلی گفتوگۆو لێدوانە لە ماددەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەی کاتیی کە تیایدا زۆر بە روونی هاتووە:

(دەبێت عەرەبە هاوردەکان بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان)، نەوشیروان ئەمین لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە گرووپی قەیرانی راگەیاند: (ئەوانەی کە لاریان نییە لەوەی کە کەرکوك بەشێکی کوردستانەو دان بە ناسنامەی نەتەوایەتی‌و کوردی بوونی سنوورەکانی کەرکوك دەبێت بتوانن لە کەرکوك بمێننەوە).

بەڵام لە هەمان کاتدا هەندێ لەسەرکردە کوردەکان لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نین‌و رایدەگەیەنن کە ماددەکە باس لەوە ناکات کە عەرەبە تازە هاوردەکان دەبێت شارەکە جێ بهێڵن.

ئەحمەد عەسکەری سیاسەتمەداری کورد لە کەرکوك رایگەیاند کە: (یاسای ئیدارەی کاتیی فشار ناخاتە سەر عەرەبە هاوردەکان کە شارەکە بە جێ بهێڵن)، بەڵام ووتی: (ئەگەر بمێننەوە ئەوا کێشەکە چارەسەر نابێت بۆیە ئێمە هانیان دەدەین کە بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان).

ئەو عەرەبە هاوردانە بە شێوەیەکی سەرەکیی لە عەرەبە شیعە مەزهەبەکان پێکهاتوون کە لە کەرکوك دەژین لە سەردەمی رژێمی بەعس دا پارچە زەوی گەورەیان لە موڵکی گشتی وەرگرتووە، ئەو هاوردانە خەڵکێکی کەم دەرامەت بوون‌و دەستیان گرتبوو بەسەر دەزگا پیشەسازییە نەوتییەکان‌و کرێکارییان تیادا دەکردن لەگەڵ ئەوەشدا لە دەزگا ئەمنییەکانی رژێمی پێشوودا لە کەرکوك کاریان دەکرد. ئەمەش وای کردبوو کە عەرەبە هاوردەکان لە نێو کەرکوکییەکاندا کەسایەتی‌و جەماوەریان نەبێت تەنانەت لە نێو زۆرێك لە وانەش کە کوردنین‌و داوای گەڕانەوەی هاوردەکان دەکەن بۆ شوێنەکانی پێشووی خۆیان، بۆ نموونە ئیسماعیل حەدیدی (کە عەرەبی رەسەنی کەرکوکەو لەسەر لیستی کوردەکان لە ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك بە ئاشکرا داوای گەڕانەوەی عەرەبە هاوردەکان دەکات بۆ شوێنی جارانی خۆیان‌و دابین کردنی شوێن‌و کار بۆیان لەو ناوچانەی کە بۆی دەگەڕێنەوەو دەبێت ئەم کارەش بە رێکوپێکی ئەنجام بدرێت ئەوانەش کە ئارەزووی گەڕانەوە ناکەن‌و نایانەوێت بگەڕێنەوە دەبێت رێگەی مانەوەیان بدرێت بەوانەشەوە کە لەلایەن کۆمپانیای نەوتی باکوورەوە دامەزرێندرابوون، بەڵام بە هۆی ئەوەی کە پێشتر جیاوازی نەتەوایەتی کراوە وەك چاوخشاندنەوەیەك بەو هەڵەیەی کە لە کاتی خۆیدا کراوە.

بە پێچەوانەوە پارتە عەرەبی‌و تورکمانەکانی کەرکوك بە پارتە نیشتمانییەکانی تریشەوە ترسی ئەوەیان هەیە کە کورد زۆرینە بەدەست بهێنێت لە کەرکوك‌و سوورن لەسەر ئەوەی کە دەبێت عەرەبە هاوردەکان مافی مانەوەیان هەبێت لە کەرکوك.

سیاسەتمەدارێکی عەرەب ووتی: (کوردەکان خوازیارن کە لە دەست عەرەبە هاوردە شیعە مەزهەبەکان رزگاریان بێت لە ناو کەرکوك ئەمەش بۆ کەم کردنەوەی ژمارەی کەسانی غەیرە کوردە لە داهاتوودا بەشداری ریفراندۆمی گشتی جەماوەری دەبن لەسەر دوا چارەنووسی کەرکوك).

کێشەکە هێشتا جێگەی مشتومڕە لەبەر ئەوەی زۆرێك لەو عەرەبە هاوردانە شوێنی رەسەنی خۆیان نییە کەس بۆی بگەڕێنەوەو دووبارە نیشتەجێ بکرێنەوە، هەندێکیشیان بۆ نەوەیەکی تازە یان زیاتر لە نەوەیەك لە کەرکوك ژیاون‌و منداڵەکانیان هیچ زانیاری‌و شارەزاییەکیان لەسەر ناوچەکانی تر نییە. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە عەرەبە کەم دەرامەتەکان بۆ کەرکوك هاتوون تەنها لەبەر ئەوەی لە دەزگا پیشەسازییە نەوتییەکان هەلی کاریان بۆ رەخساند بوون لە کاتێکدا رژێمی پێشوو بە شێوەیەکی کارا پشتگیری هاتنیان دەکردو بەدەر لە کوردەکان هاوکار بوو بۆ کۆچی لەم شێوەیەی کارکردن‌و هاتنیان بۆ کەرکوك‌و رەخساندنی هەلی کار بۆیان، هەموو ئەوانەی کە بە بیانووی گەران بە دوای هەلی کارکردندا لە کەرکوك نیشتەجێ کرابوون. داردەستی رژێم بوون‌و بۆ بەرژەوەندی رژێم کاریان دەکرد. هەر لەبەر ئەوەشدا کە ماددەی (٥٨) باس لەوە ناکات کە دەبێت عەرەبە هاوردەکان لە کار دوور بخرێنەوە تەنانەت لە بوارەکانی نەوتیشدا بەڵام داوا لە حکومەت دەکات کە هەلی کارکردن لە کەرکوك دا دەستە بەر بکات.

کێشەیەکی تری ماددەی (٥٨) پەیوەندارە بەو برگەیەی کە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی رادەسپێرێت کە چۆن باری گۆڕین‌و دەستکاریکردنی سنوورە کارگێرییەکان لەلایەن رژێمی پێشووترەوە وەك خۆی لێ بکرێتەوە. هەر چەندە سەرۆکی عێراق لە ساڵی (٢٠٠٥)دا کە کەسێکی کورد بوو بە ئاراستەی کارکردن لەپێناو نەهێشتنی دیاردەی بە عەرەب کردن تێدەکۆشا، بەرێز (جەلال تاڵەبانی) بۆ چوار ساڵی تر لە دوای هەڵبژاردەکانی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٥) دا هەڵبژێردرایەوە بەڵام هیچ هەنگاوێك بۆ دامەزراندنی میکانیزمێك بۆ چارەسەری کێشەی سنووری کەرکوك

نەخرایە روو. وەك بەرپرسێکی کورد ئاماژەی پێداو ووتی: (ئەمە کێشەیەکی بەربڵاوەو زۆر لایەن دەگرێتەوە، تەنها سنوورەکانی کەرکوك نین کە رژێمی پێشوو بۆ گۆرینی باری سیاسی گۆرپبێتی و دەستکاری کردبێت. تەنانەت بۆ نموونە ناوچەی دەسەڵاتی عەرەبە سوننەکان لە پارێزگای ئەنبار کێشەی سنووری هەیە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بە کردنەوەی کێشەی کەرکوك مەترسی دروست بوونی ئاڵۆزی بەکردنەوەی هەموو کێشەکانی تری لێ دەکەوێتەوە).

لەگەڵ ئەوەشدا، سیاسەتمەدارێکی کەرکوك پرسی کە: ئایا کێ ئیمزای رێککەوتنێك سەبارەت بە گێرانەوەی ناوچە رەسەنەکانی کەرکوك بۆ سەر کەرکوك دەکات؟ بە دڵنیاییەوە ئەمە کاری ئەنجومەنی نوێنەران نابێت و ئەگەر شتەکان وا ئاسان بن ئەوا پێکهێنانی حکومە بەم شێوەیە دوا ناکەوێت و هەموو ئەو کاتانەی ناوێت.

وررووژاندنی تایبەتی دژ بە کورد ئەنجامی بێ سوودی هەبووە بەسەر میکانیزمی هەڵوەشاندنەوەی بە عەرەبکردن، لەگەڵ ئەوەشدا پەیمانی پێکهێنانی حکومەت لەنێوان لیستی سەرەکی شیعەو کوردەکان لە مانگی گوڵانی ساڵی (٢٠٠٥)دا ئیمزا کرا کە تیایدا هاتووە حکومەتی گوێزانەوە دەبێت لە دوای یەك مانگ لە دروست بوونیدا دەست بکات بە جێبەجێ کردنی کاری پێویست سەبارەت بە ناوەرۆکی ئەو برگانەی کە لە ماددەی (٥٨)دا ئاماژەیان پێدراوە. بەڵام سەرۆك وەزیران ئیبراهیم جەعفەری هیچ بودجەیەکی بۆ ئەو مەبەستە تەرخان نەکردو هیچ گۆرانێك لەو کاتەوە سەبارەت بە کەرکوك و دەستەی باڵای ئاسایی کردنەوەی کەرکوك (Supreme commission for normalization in Kirkuk) کە بە دەستەی ماددەی (٥٨) ناسراوە، نەهاتە ئارایەوەو ماددەکە بە بلۆك کراوەیی مایەوە، وەك ئەوەی کە لەلایەن سەرکردەیەکی سیاسی راگەیاندرابوو و ووتی: (هیچ نەکراوەو هیچ ناکرێت لەو بارەیەوە، تەنانەت ئەگەر بشیانەوێت کە بریار لەسەر شتێك بدەن ئەوا دوابریار لەلایەن سیاییەکانەوە لە پشت پەردەوە کۆسپ و تەگەرەی دەخرێتەبەر).

سەرۆکی لیژنەی باڵای ئاسایی کردنەوە، حەمید مەجید موسا جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە دەبێت بە پلەی یەکەم گرنگی بدرێت بە پەیداکردنی هەلی کارکردن و بەرزکردنەوەی باری ئابووری بۆ ئەوەی توندوتیژی کەم بکرێتەوە بەڵام ئەو گومانی هەبوو کە ئەمە رووبدات. هێشتا هەندێ ئومێد ماون بۆ کارا کردنەوەی لیژنەی باڵا ئەویش لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی تازە دامەزراو لە ئایاری ساڵی (٢٠٠٦)دا.

حەمید مەجید موسا رایگەیاند کە کوردەکان و زۆرێك لە چاودێرە سەربەخۆکان گلەییان هەبووە سەبارەت بە کارا نەبوونی خێرای دەستەی داواکاری موڵکایەتی عێراق (Iraq property claims commossion) کە لەلایەن دەسەڵاتی کاتیی هاوپەیمانان (Provisional authority coalition)ەوە دامەزرا لە کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤) دا بۆ یارمەتیدانی گەرانەوەی موڵك و ماڵی دەست بەسەردا گیراو بۆ خاوەنە رەسەنەکانیان.

لە ماوەی چوارییەکی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٦)دا دەستەی داواکاری موڵکایەتی عێراق بریاری لەسەر هەندێك لەو (٢١,٠٠٠) داواکاریانە داوە کە زیاترلە (١٣١,٠٠٠) داواکاری جۆراوجۆریان لەبەر دەستدا هەبووەو لەو (٢١,٠٠٠) داواکاریانە تەنها (٤,٠٠٠) داواکاری لە داواکارییەکانی پارێزگای کەرکوك بوون، ئەو دەستەیەی کە لە ئاداری ساڵی (٢٠٠٦)دا ناوی گۆردرا بە (دەستەی چارەسەرکردنی ململانێ موڵکییە راستەقینەکان) دەناڵێنێت بەدەست کێشەکانی داموو دەزگاکان و نەبوونی بودجەو چارەی پێویست و کەم و کورتی یاسایی و بیروکراتیەت و نەبوونی ئامێری پێویست، کێشەی زۆری بۆ کوردەکان نایەوە.

قوباد تاڵەبانی نوێنەری (ی. ن. ك.) لە ئەمریکاو کوری جەلال تاڵەبانی ووتی: (نەبوونی پرۆسەیەکی دیار هەموو شتێکی پوچەڵکردەوەو باوەری کۆمەڵانی خەڵکی بە ئێمە لاواز کرد بۆیە پێویستە ئێمە پرۆسەی گەراندنەوە بکەین بۆ پرۆسەیەکی یاسایی بەڵام نەك لە رێگەی دەزگاکانی وەك (IPCC) دەستەی داواکاری موڵکیەتی عێراق کە نە راسپاردەو نە بودجەو نە ستاف تایبەتی خۆی نەبووە).

لەگەڵ ئەوەشدا کێشەی سەرەکی کوردەکان گێرانەوەی ماڵ و موڵکی دەست بەسەر داگیراویان نییە بەڵکو کێشەکە گەرانەوەی خەڵکی ئاوارەیە بۆ ناو ماڵ و شارو گوندەکانیان کە لەگەڵ زەویدا تەخت و وێرانکراون، ئەم کێشەیە بە شێوەیەکی سەرەکی بە کێشەیەکی سیاسی و ئابووری دادەنرێت نەوەك دادوەری، بۆیە ئەم کێشەیە لە چوارچێوەی بەرنامەو کاری (IPCC)دا چارەسەر ناکرێت.

سەرەرای ئەوەش (IPCC) دەسەڵاتی ئەوەی نەدراوەتێ کە بتوانێت قەرەبووی ئەو کەسانە بکاتەوە کە خانوو و ماڵەکانیان تێکدراون و رووخێندراون و هەروەها نەتوانراوە قەرەبوی ئەو کەسانەش بکاتەوە کە خانووەکانیان دەستیان بەسەردا گیراوەو فرۆشراون چونکە ئەم کێشەیە بە یەکێك لە کێشە گەورەکان دادەنرێت لە کەرکوکدا، هەر چەندە لیژنەی ماددەی (٥٨) دەسەڵاتی ئەوەی هەیە کە لەم کێشانە بکۆڵێتەوە بەڵام خەریکە کاریگەری نامێنێت و تەواو دەبێت.

لەبەر ئەوەی هیچ پێشکەوتنێك لە رێگەی ئەو دەزگایانەوە بەدی ناکرێت، بۆیە کوردەکان هەوڵی زۆر جدی دەدەن بۆ ئەوەی کاریگەرییان هەبێت بەسەر گۆرانکارییەکاندا لەسەر ئەرزی واقیع لە کەرکوك بە بێ ئەوەی پەنا بەرنە بەر توندوتیژیی و کاری ئاژاوە گێریی بەرامبەر بە بریارەکانی یاسای کاتیی گوێزانەوە یان دەستوور. کوردەکان پارەو پولیان هەیەو دەتوانن زۆربەی ئاوارە کوردەکانی کەرکوك نیشتەجێ بکەنەوە لە شارۆ شارۆچکەکانەوە بە هاوکاری حکومەتە بیانییەکان کە پشتگیری ئاوەدانکردنەوەی دێهاتەکانیان کردووە.

قوباد تاڵەبانی رایگەیاندو ووتی: (ئێمە بە شێوەیەکی نا فەرمی هانی کەرکوکییەکان دەدەین بۆ ئەوەی بگەرێنەوە کەرکوك و پارەو کرێی گواستنەوەیان بۆ دابین دەکەین. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم کارەمان بە شێوەیەکی رێکوپێك بەرێوە دەروات بەڵام ئەوەی تا ئێستا جێگەی کەم و

کورتییەو پێویستە بکەوێتە سەر ڕێچکەی خۆی دۆزینەوەی میکانیزمێکی بەهێزە بۆ جێبەجێکردنی ماف گەڕانەوەی خەڵکەکە بۆ کەرکوك).

ئاوارە گەڕاوە ناوخۆکانی کەرکوك لە دوو شوێنی کاتییدا نیشتەجێ کراون کە ئەوانیش لە بارەگاکانی فەیلەقی یەك نزیك فرۆکەخانەکەوەو لە پەنجا عەلی لەسەر ڕێگەی لەیلان، شارۆچکەیەکی ڕۆژهەڵاتی کەرکوکە، کە بە ئاراستەی ناوچە گوندنیشنەکانی سنووری گەرمیاندا دەڕوات، بەم شێوەیە ژیان بەسەر بردن‌و ئەم ژینگە نا تەندروستییە وای لەو گوندنیشنە بێ لانانە کردووە کە ئامێرێکی بە کەڵك بن کە لەم ڕێگەیەوە دەبێت پارتە کوردییەکان فشار دروست بکەن کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی هاوکاری ئاوارە ناوخۆییەکان بکات کە بگەڕێنەوە ناوچەکانیان ئەویش بە دابین کردنی خزمەت گوزارییە سەرەکییەکان‌و بوژاندنەوەی ژێرخانی ئابووری. سەرەڕای ئەوەش هەنگاوی لەسەر خۆی ئاوەدانکردنەوەو گەشەسەندنی توونودتیژی لە کەرکوك، کە بەشێکی پەیوەندی بە بوونی دەرکراوە ناوخۆییەکانەوە هەیە، وایکردووە کە سیاسەتمەدارەکان ڕازی بن بەوەی کە باشترین‌و گونجاوترین چارەسەر ڕازیکردنی دەرکراوەکان بێت کە لەسەر گوندەکانیان ڕاگوێزراون، بگەڕێنەوە لادێکانیان‌و لە شاردا نیشتەجێ بن.

بە پێی ووتەکانی حەمید مەجید موسا ئەم کارە ئەوە دەخوازێت کە حکومەتی فیدراڵ گوندەکان ئاوەدان بکاتەوە وەك ئەوەی کە حکومەتی هەرێمی کوردستان لە دوای ساڵی (١٩٩٢)دا لە هەر سێ پارێزگا کوردییەکاندا بە سەرکەوتوویی پەیڕەوی کرد، ئەندامێکی تورکمانی ئەنجومەنی پارێزگا ڕەزامەندی خۆی نیشانداو ووتی: (هەموو ئەوانەی کە ڕاگوێزراون‌و دەرکراون لەسەر گوندەکانیان پێویستە بگەڕێنەوە ناوچەکانیان‌و دەبێت گوندەکانیان بۆ دروست بکرێتەوەو لەسەر حکومەت پێویستە هەلی کارکردنیان بۆ دابین بکات لەبەر ئەوەی هەر کاتێك کوردە گوندنیشنەکان بێنە ناو شاری کەرکوك دەبێتە هۆکارێك بۆ زیاتر کێشەی بێکاری‌و نانەوەی ئاشووب‌و تاوان).

هەر چەندە نزیکەی (٣٠٠,٠٠٠) سێ سەد هەزار کورد لە وانەیە گەڕابێتەوە بۆ کەرکوك‌و ناوچەکانی دەورووبەری لە ساڵی (٢٠٠٣)ەوە بەڵام نەبوونی یارمەتی گرنگی حکومەتی ناوەندی بۆتە هۆکارێك بۆ ئاڵۆز بوون‌و دواخستنی نەهێشتنی دیاردەی عەرەبە هاوردەکان بە ڕێگەی قەرەبووکردنەوەو نیشتەجێ کردنەوەیان. سەرکردە کوردەکان لەو بڕوایەدان بە گەڕانەوەی ژمارەی زیاتری کوردەکان، دەتوانن لە کەرکوك‌و ئەو ناوچانەی داوای دەکەن بە زۆرینەی دەنگ ڕیفراندۆم ببەنەوە ئەویش بە پێی ماددەی دەستووری، هاوکات لەگەڵ هەنگاونانی پرۆسەی (ئاسایی کردنەوە)شدا لەوانەیە چارەسەری کێشەکان ئەوەندە سادەو ئاسان نەبن.

*** هەل‌و مەرج‌و کۆسپ‌و تەگەرەکان:**

**أ. کورد:**

هێزی سیاسی‌و سەربازی‌و بە قەراربوونی ئاشتی ناوخۆو بوونی پەیوەندی پتەو لەگەڵ ئەمریکا وای لە کورد کردووە کە هەنگاوی باش بەرەو پێشەوە بنێت لە هەردوو ڕووی یاسایی‌و ڕاستەقینەوە بۆ گێڕانەوەی کەرکوك بۆ سەر هەرێمی فیدراڵ. سەرکردە کوردەکان باوەڕی پتەوی خۆیان دەربڕیوە بەوەی کە ستراتیژییەتەکەیان سەرکەوتوو دەبێت‌و لایەنگرەکانیان بەوە ڕازیکردوون کە سەرکەوتن لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٧)دا مسۆگەر دەبێت لەگەڵ ئەوەشدا شتێکی ئاساییە کە کوردەکان ڕوو بە ڕووی کۆمەڵێك کۆت‌و بەند ببنەوە بە تایبەتی لە کاتی ڕەنگدانەوەی توووند، وەك:

**یەکەم:**

لە کاتێکدا کورد خاوەنی هێزێکی سیاسییە بە بەراوورد لەگەڵ حکومەتی ناوەندی بەڵام مەرج نییە ئەمە درێژە بخایەنێت‌و ئەگەری ئەوە هەیە کە عێراق ئارامی بە خۆیەوە ببینێت‌و حکومەتی ناوەندیش بگەڕێتەوە دۆخی بە هێزی خۆی. ئەگەر کوردەکان بە یەکگرتوویی بمێننەوە ئەوا ئەو کات دەتوانن ڕووبەڕووی ئاستەنگەکانی ببنەوە لە هەوڵدان بۆ بەرەو پێش بردنی باسەکان. ئەمەش کارێکی زۆر تایبەتە لەبەر ئەوەی کوردەکان ئەزموونی ئارام گرتنیان هەبووە لەگەڵ زۆرێك لە هاوبەشیەکانیانەوەو بەردەوامیش دەبن لەسەر ئارام گرتن تاوەکو زۆرترین مەبەست بەدەست دەهێنن. سەرەڕای ئەوەش لەوانەیە کوردەکان ڕووبەڕووی دژایەتی کردنی توند ببنەوە لە بەرامبەر ڕێگە نەدان بە مانەوەی عەرەبە هاوردەکان لە کەرکوك نەك تەنها لەبەر ئەوەی لەلایەن سەرکردەکانی حکومەت‌و عەرەبە عێراقییەکان بە گشتی ڕووبەڕوو ببنەوە بەڵکو لەلایەن ئەندامانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیشەوە کە ماف هاوواڵاتیبوون پارێزراوە بۆ هەموو کەسێك کە ژیان لە هەر شوێنێکی عێراقدا بە کەرکوکیشەوە بەسەر بەرێت.

**دووەم:**

هەروەها توانای هێزی سەربازی کورد سنووردارە، چەکدارە شەڕکەرەکان وابەستەی ناوچە سەختەکان‌و بە پێی مێژوو سەلماندوویانە کە لە زاڵ بوون بەسەر ناوچە دەشتاییەکاندا لاوازن بە تایبەتی لەو ناوچانەی کە دانیشتووانی لە پێکهاتەی جیاجیا بن وەك کەرکوك. هەر چەند کوردەکان بە شێوەیەکی خێرا هێزە تەقلیدییەکانیان پێشخستن بەڵام لەوانەیە حکومەتی عێراق بتوانێت ئەم پێشخستنە پەکبخات‌و بیگەڕێنێتەوە دواوە لە کەرکوك‌و هەر شوێنێکی تر. لەلایەکی ترەوە لەوانەیە کورد ستراتیژێکی هەبێت بۆ بەدەست هێنانی کەرکوك بەڵام چۆن دەتوانن بیپارێزن؟

**سێیەم:**

کوردەکان لە ئەزموونی تاڵی خۆیانەوە فێر بوونە کە پشتیوانی ئەمریکا لە گۆڕاندایەو قابیلی گۆڕانە. واشنتۆن لە ماوەی ڕابردوودا کوردەکانی بەکارهێناوە وەك یارییەکی ناوچەییو هەر کاتێك کە پەیوەندی بکات بە تورکیاو گرنگیو هاریکاری دەوڵەتێکی ناوەندی بە هێز لە عێراقدا بکات، ئەمریکا دەتوانێت بەسەر ویستی کوردەکان زاڵ بێتو دژیان بوەستێتەوە.

(ئینور چەڤیك) کە ڕۆژنامەنووسێکی تورکییەو خۆی بە نزیك لەو سەرکردانە دەزانێتو ووتی: (سەرکردە باڵاکانی کورد باش دەزانن کە لە کۆتاییدا ئەمریکا دەیانفرۆشێت).

**چوارەم:**

سەقامگیریی سیاسی ناوخۆ ناتوانرێت بە ئاسانی دەستەبەر بکرێت، سەرەڕای ململانییەکی خوێناویماڵوێرانکەر لە ناوەڕاستی نەوەدەکان (١٩٩٠)ەکان بەڵام یەکێتیو پارتی توانیویانە هەستێکی هاوبەش بخەنەروو بۆ پێگەی کورد لە بەغدا، یەکگرتوویيو پەیوەندی باشی هەردوو پارتەکە لە ماوەی سێ ساڵی ڕابردوودا ئاماژەیەکی بۆ سەرکەوتنەکانیان لە بەغدا کە چی یەکخستنەوەی هەردوو حکومەتەکانیان بە شێوەیەکی لەسەر خۆ بەرێوە دەچێتو ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لێکتێنەگەیشتن لەنێوانیاندا هێشتا بوونی هەیەو برینەکان قووڵنو تا ئێستاش برینەکان هەر گەرمنو سارێژ نەبوونە (برینەکان خوێنیان لێ دەچۆرێت) هەردوو پارتەکە لە مەیدانی کارکردندا جیاوازن، مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی یەکگرتووی کوردستان قورسایی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانی خستووەتە کوردستان کە چی جەلال تاڵەبانی سەرۆکی کۆماری عێراقو ڕابەری (ی. ن. ك.) دوارۆژی پارتەکەو هەرێمەکەی خستووەتە ژێر مەترسی بە هۆی مانەوەی لە بەغداو گرنگیدان بە کاروباری عێراق.

ئایا سەرکردەکانی کورد لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕووبەڕوو بوونەوەو خاڵەکانی پێشبڕکێدا، بۆ نموونە بۆ زاڵ بوون بەسەر کەرکوكو هەلی دەست گرتن بەسەر نەوتی کەرکوکدا دەتوانن پارێزگاری لەو بڕوا پتەوە بکەن کە تەنها هاوپەیمانی ستراتیژی نێوان (PDK)و (PUK) کاریگەری دەبێت بۆ زاڵ بوون بەسەر هەموو ئەو شتانەی کە جێگەی گرنگی پێدانی هەردوو پارتەکە دەبێت؟ لە کۆبوونەوە تایبەتو چاوپێکەوتنەکانی کەناڵەکانی ڕاگەیاندندا بەڕێز تاڵەبانی چەندین جار ئەوەی دووپات کردوتەوە کە ڕووبەڕوو بوونەوەو بەکارهێنانی دەسەڵات لەپێناو کەرکوکدا بە دوور نازانێتو پێی وایە هەر تێبینییەکی قایلکاری سەبارەت بە کەرکوك وا لە سەرۆك بارزانی دەکات کە هەنگاوەکانی سەخت بێتو پشتیوانی لە (PUK)یەوە بە دەست بهێنێت کە ئەمە لەنێوان کۆمەڵانی خەڵکدا شتێکی چاوەڕوانکراوەو بە شێوەیەکی چالاك لەلایەن هەردوو سەرکردەکانەوە دیارو ئاشکرایە کە کەرکوك لە داهاتوویەکی نزیکدا دەکەوێتە باوەشیانەوەو بەم پێیەش چارەسەرێکی ئاشتیانە بۆ کێشەی کەرکوك پەیوەندار دەبێت بەو ململانێیەی کە (PDK) و (PUK) پێوەی دەناڵێنن.

**پێنجەم:**

دوای ئەوەی کەهێزەکانی عێراق لە ساڵی (١٩٩١) دا لە بەشێکی زۆری کوردستان پاشەکشەیان کرد کورد بە کردار خاوەنی سەربەخۆیی خۆی بووەو ئەم ئەزموونە بەشێوەیەکی سەخت ڕووبەڕووی پشت بەستن بە ئابووریو ژێرخانی دەوڵەتی عێراقو وڵاتانی دراوسێ بووەوە. بۆ نموونە کورد ڕێژەی (١٧٪)ی بودجەی نیشتمانی عێراق وەردەگیرێتو پارەی عێراقی بەکاردەهێنێت، بۆ دابینکردنی پێداویستی کارەبا داوا لە تۆڕی دەسەڵاتی نیشتمانی دەکات. ئەگەر کوردەکان دەسەڵاتی تایبەتی خۆیان بسەپێنن بەسەر کەرکوك، حاڵەتی ڕاستەقینە ئەوە دەخاتە ڕوو کە نەوتی کەرکوك لە پاڵاوگەی بێجی کە ناو جەرگەی عەرەبی سوننەیە بەرهەم بهێنرێتو بە ڕێگەی بەندەری تورکی جەیهانەوە بنێردرێتە دەرەوە بۆ بازارەکانی نەوت. ڕووداوە هەنووکەییەکان ئەمەیان ئاشکراکردووە کە چەند ئاسانە بە هێرش کردنە سەر بۆرییە نەوتییەکانو تانکەرەکانی گوێزانەوەی نەوت هەوڵی ناردنە دەرەوەی نەوت بدرێت.

**شەشەم:**

هەرێمی کوردستان هەرێمێکی داخراوەو پشت دەبەستێت بە مامەڵەکردن بە ویستی وڵاتە دراوسێکان کە هیچ یەکێك لەم دراوسێیانە ڕێگە نادەن کورد دەسەڵاتی بەسەر کەرکوکدا هەبێتو ببێتە هۆکارێك بۆ بەسەربەخۆیی ناساندنی هەرێمەکەو هەموویان دژی بەرژەوەندییەکانی کوردن. لە ڕاستیدا باری نادیاری هەرێمی کوردستانو بە دواداچوونی دوژمنانی ئیقلیمی کورد هۆکاری بۆ ڕێگرتن لە بەردەم پرۆسەی وەبەرهێنانی بیانی.

**حەوتەم:**

جێبەجێ کردنی ماددەی (١٤٠)، کە تەنها پەیوەندار نییە بە کەرکوك بەڵکو پەیوەنداره بە هەموو ئەو ناوچانەی کە کورد داوای دەکات، ئاڵۆزەو پێویستی بە هەماهەنگی ئەکتیڤی حکومەتی ناوەندییەوە هەیە کە ئەگەری ئەوە هەیە هەوڵی دواخستنی بداتو بە دەردی ماددەی (٥٨)ی ببات و جێبەجێی نەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا زمانی ماددەی (١٤٠) ئاڵۆزە سەبارەت بە ئەنجامدانی کاری پێویست بەڵام کێ ماف ئەوەی هەیە کە دەنگ بدات بۆ ڕیفراندۆمی کەرکوكو کێ چارەنووسی ئەو ناوچانەی کە ڕیفراندۆمی تیادا ئەندام دەدرێت دیاریی دەکات. ئارەزوویەکی سیاسیانە کە بتوانێت یاسای پێویست دابرێژێت بوونی نییەو وەك ئەوەی کە باسکراو ئاماژەی پێدرا. گێڕانەوەی باردۆخەکە بۆ پێش سنووری ئیداری ساڵی (١٩٦٨) بارگرژیو ئاژاوەیەکی زۆری سەبارەت بە دابەش بوون لێ دەکەوێتەوەو لەوانەیە ببێتە لەمپەرێك لەبەردەم جێبەجێ کردنی هەر پلانێکی دارێژراو بۆ چەسپاندنی هێمنیو ئارامی بۆ کەرکوك، لە کۆتاییدا داواکردنو زەروورەتی ئەنجامدانی سەرژمێریو ڕیفراندۆم لە کەرکوك دەبێتە هۆکارێك بۆ پشێوی دیموگرافی، لەوانەیە پارتەکان ئەندامەکانی خۆیان لە دەرەوەی کەرکوکەوە هانبدەن کە

خۆیان ناونووس بکەن بۆ ئەم مەبەستە وەك ئەوەی کە کورد کردوویەتیو عەرەبەکانیش هەرەشەی ئەنجامدانی هەمان هەڵسوکەوتیان کردووەو لەوانەیە ئەنجامدانی سەرژمێری دەست بە جێ کشانەوەو بەشداری نەکردنی (بایکۆت کردن) ی ریفراندۆمی لێ بکەوێتەوەو نەتەوەیەك یان چەند نەتەوەو کۆمەڵەیەکی تر لەم بارەیەوە زەرەرمەند بن.

لە کۆتاییدا هەر کردارێك کە لەلایەن پارتە کوردییەکانەوە لەوەتەی گەڕاونەتەوە بۆ کەرکوك لە مانگی گوڵانیساڵی (٢٠٠٣)وە ئەنجام درابێت یان بە پێچەوانەوە دژ بە هەر هەوڵێك بووە کە نراوە بۆ لە باربردنی پێکەوە ژیانی ئاشتیانە لە کەرکوك، ئەو چاوپێکەوتنانەی کە لە ماوەی سێ ساڵی رابردوودا لەگەڵ کەرکوکییەکاندا ئەنجامدراون، ئاماژە بەوە دەدەن کە ئەوان پێکەوەژیانی نەتەوەکان بە شێوەیەکی ئاشتیانە زۆر بە بەهاو بەرز دەنرخێننو زۆربەی کەرکوکییەکان سکاڵا دەکەن سەبارەت بەو پارتانەی کە لە دەرەوەی کەرکوك تەنها بەناو نوێنەرایەتییان دەکەنو بە ووتاری هاندانو کرداری ناپەسەند هەڕەشە لە ئاشتی دەکەن.

تەنانەت ئەم راستییە بۆ زۆرێك لەو کوردانەی کە بە رێگەیەکی تر پشتوانی لە داوای پارتە کوردییەکان دەکەن بۆ گەڕانەوەو لکاندنی کەرکوك بە هەرێمی کوردستانەوە شتێکی دیارو بەرچاوە. بۆ نموونە هەندێ راوبۆچوون هەیە پێی وایە ئەگەر پارتە کوردییەکان لەگەڵ گەڕانەوەیان بۆ کەرکوك مامەڵەیان میانڕەوانە بوایەو زیاتر جەختیان لەسەر پێکەوە ژیانی ئاشتیانە بکردایەتەوە ئەوا پێشوازییەکی باشتر دەکران دەیانتوانی کەرکوك بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوەو ئەو پارتانە بەوە تاوانبار دەکەن کە نەیانتوانیوە پرۆژەی خزمەت گوزاری بۆ کەرکوك دابین بکەن.

کوردێکی خەڵکی شاری کەرکوك کە بەسەردان گەڕابووەوە بۆ کەرکوك رایگەیاندو ووتی: (ئێستا کەرکوك هیچ نییە) و درێژەی بە قسەکان داو ووتی: (کەرکوك ترسناکەو هیچ پرۆژەیەکی خزمەتگوزاری بۆ ئەنجام نەدراوەو شارێکە فەرامۆش کراوەو پارتە کوردییەکان هیچیان نەکردووە بۆ باشتر کردنو گەشەکردنی شارەکەو حکومەتی ناوەندیش پارەیەکی وای بۆ تەرخان نەکردووە کە ببێتە هۆکارێك بۆ پارمەتیدانی شارەکە).

ئەگەر هەر کاتێك هەلێك هەبووبێت ئەوا ئیمڕۆ ئەم هەلە نییەو لە دەست دەرچووەو قسەو ووتە سەرنج راکێشە بریندارکەرەکانی کورد بە شێوەیەکی سەرەکی پێکهاتووە لە چەند جارە دووبارە کردنەوەی ئەوەی کە کەرکوك بە مافێ فەرمی خۆیان بزانن لە بری هەوڵدانو باوەڕپێهێنانی عەرەبو تورکمانەکان بەوەی کە ئەوان بە هاتنە ژێر حوکمو یاسای کوردستان سوودمەند دەبن ئەویش بە پشتگیری کردنو بنیاتنانی پرۆژە کۆمەڵایەتییەکانو یەکسانی لە دامەزراندنو خزمەتگوزارییە مەدەنییەکان. بەم شێوەیە عەرەبو تورکمانە کەرکوکییە رەسەنەکان بە شێوەیەکی روونو ئاشکرا رایانگەیاند کە گەڕانەوەی کەرکوك بۆ سەر هەرێمی کردستان، هێڵێکی سووری نەگۆڕە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هێزێکی شەرکەریان نییە کە بتوانن بەرامبەر بە هێزی کوردەکان بوەستنەوە، هەندێ لە عەرەبو تورکمانەکان پێشنیازیان کردووە کە دوور نییە پەنا بەرنە بەر توندوتیژیو بە شێوەیەکی گشتی بە پشتیوانی لایەنە بیانییەکان بتوانن لە دژی دەسەڵاتی کوردی لە کەرکوك بەرەو ناخۆشی بەرن بۆ رێگرتن لە بەردەم گەڕانەوەی کوردە راگوێزراوەکانی کەرکوك بۆ شارەکەیان سەرەڕای ئەوەش، دوور نییە کە کوردەکانی نیشتەجێی بەغدا تووشی نارەحەتی ببن لە ئەنجامی ئەو کردەوانەی کە پارتە کوردییەکان لە کەرکوكو ئەو ناوچانەی کە داوای دەکەن ئەنجامی دەدەن هەر بۆیەش هەڕەشەی ئەوەیان کردووە کە بۆ هەر خێزانێکی عەرەب کە لە کەرکوك دوور بخرێتەوە، ئەوا خێزانێکی کوردی لە بەغدا دەردەکەن.

بە پێی پێشبینی هەندێك لە سەرکردە کوردەکان کە پێیان وایە، بە هۆی هەموو ئەو فاکتەرانەوە دەردەکەوێت کە رووداني زاڵبوونی دەسەڵاتی کوردی بەسەر کەرکوك چی بە هۆی پەیرەو کردنی دەستوورەوە بێت یان بە هۆی بەکارهێنانی هێز ئەوا کارێکی هەر وا ئاسان نییە.

**ب. تورکمانەکان:**

تورکمانەکان تا مانگی گوڵانی ساڵی (٢٠٠٣) بە زۆرینەی ناو شاری کەرکوكو کەمینەی پارێزگاکە ئەژمار دەکران. تورکمان بە ئازارێکی جەرگبڕانەوە چاودێری گەڕانەوەی دەیان کوردیان کردووەو پێیان وایە کە ئەگەر ئەو کوردانە بۆ مانەوەو نیشتەجێ بوونیش نەگەڕابنەوە ئەوا بۆ ئەوە هاتوونەتەوە شارەکە کە لە مانگەکانی کانوونی دووەمو یەکەمی ساڵی (٢٠٠٥)دا دەنگ بدەنو هەروەها بۆ ئەوەی کە لە تشرینی یەکەمی (٢٠٠٥)دا بەشداری لە ریفراندۆمی دەستووری دا بکەن. دەرکەوتنو گەشەی کورد بەم شێوەیە لە کەرکوك دا کە لە روانگەی تورکمانەکانەوە شارێکی سەرەکی تورکمانەکانە، وا دەردەخات کە تورکمان ژمارەیەکی بچوکن لە هەموو عێراقدا.

هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە کە تورکمانەکان بە دوای پشتیوانییەکی دەرەکیدا گەڕاون کە بتوانێت بەرگری لە کێشەکەیان بکاتو ئەم کارەشیان لەبەر دوو سەرچاوەی تەواو جیاواز خستووەتە بەردەست کە ئەوانیش: تورکمانە نەتەوە پەرستەکان کە پەیوەندی نزیکیان لەگەڵ تورکیا پەیدا کردووەو ئەو رێکخراوەش کە بەم شێوەیە هەڵسوکەوت دەکات، بەرەی تورکمانی عێراقی یە (ITF) کە هاوپەیمانییەکی ناجێگیری پارتە تورکمانەکانەو یارمەتی دارایی لە ساڵانی (١٩٩٠) نەوەدەکانەوە لەلایەن هێزە ئەمنییەکانی تورکیاوە دابین دەکرێت.

ئەم بەرەیە لە هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥)دا (٣) سێ کورسیان بە دەست هێنا بەڵام لە هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمی (٢٠٠٥)دا تەنها (١) یەك کورسیان بە دەستهێنا. زۆربەی ئەندامەکانی ئەو بەرەیە پێکهاتوون لە سوننە مەزەبو لە هەمانکاتدا شیعەی عەلمانیشیان تێدایەو لەبەر ئەوەی زۆرێك لەو تورکمانانە لەدامو دەزگا ئەمنییەکانی رژێمی پێشوو لە پۆستی باڵادا

خزمەتیان هەبووە بۆیە پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان هەندێك لەو ئەندامانەو چەکدارە یاخیبووەکاندا هەیە.

بەپێچەوانەوە، ئەو شیعە ئیسلامییانەی کە دژی رژێمی پێشوو وەستا بوونەوەو مەینەتی زۆریان بە دەست رژێمەوە چەشتبوو بە ئاراستەی یەکێتیی ئیسلامی تورکمانی (TIU) یان پارتە شیعە عێراقییەکانی وەك حیزبی دەعوەو ئەنجوومەنی بالای شۆرشی ئیسلامی رۆیشتن.

یەکێتیی ئیسلامی تورکمانی (TIU) لە کۆتایی سالی (٢٠٠٤)دا، پەیوەندی بە حیزبی دەعوەو ئەنجوومەنی بالای شۆرشی ئیسلامییەوە کرد بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانی عێراقی یەکگرتوو (UIA). هاوپەیمانی عێراقی یەکگرتوو (UIA) لە هەلبژاردنەکانی کانوونی یەکەمی سالی (٢٠٠٥)دا، (٥) پێنج کورسی لە کورسییەکانی ئەنجوومەنی نوێنەران دا بە تورکمانەکان‌و لە بەرامبەر ئەوەدا دەسەلاتی هەلبژاردنیان بەکارهێنا (بە پشتیوانی‌و پشتگیری ئێران) بۆ بەرگریکردن لە بەرژەوەندییەکانی تورکمان لە عێراق بە گشتی‌و لە کەرکوك بە تایبەتی.

لە نیسانی سالی (٢٠٠٦)دا، راپۆرتەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەنجوومەنی بالای شۆرشی ئیسلامی لە عێراق پشتیوانی بوونی میلیشیای بەدری سەر بە حیزبەکەی خۆی کردووە لە کەرکوك. چەند فاکتەرێك‌و هۆکارێکی سەخت هەن لە بەردەم توانای تورکمانەکان بۆ ئەوەی بتوانن بەرەنگاری هێرشی توندی ئاشکرای کوردەکان ببنەوە.

**یەکەم:** هەردووکیان، ناکۆکی مەزهەبی، نێوان سوننەو شیعە، و هەروەها زۆربەی پارتە تورکمانییەکان هەلوێستی تورکمانەکانیان لاواز کردووەو پارتە کوردییەکان هەر زوو توانیان تورکمانەکانی کەرکوك بەلای خۆیاندا کێش بکەن‌و هێناویانەتە نێو لیستی هاوپەیمانی خۆیان، کە بە لیستی برایەتی کەرکوك ناسراوە. ئەگەر لە دابینکردن‌و بەرقەراربوونی ئاشتی ولە کۆنترۆلکردن دا، کورد بتوانێت گرنگی بدات بە تورکمان‌و هەست‌و سۆزیان رابکێشێت بۆ لای خۆی‌و پیشانی بدەن کە ئەوان جێی سوودی هەموو دانیشتووان دەبن‌و ئەوا کورد دەتوانێت هاوکارو هەماهەنگکار بن بۆ بە دەست هێنانی مافی زیاتری نەتەوەی تورکمان. تورکمانەکان هەول دەدەن بۆ یەکخستنەوەی پارتەکانیان یان دروستکردنی پارتێکی تازە بۆ کەم کردنەوەی نیگەرانی‌و ئەو نارازیبونەی کە تا ئێستا لە نێو پارتە تورکمانەکان دا بەدی دەکرێت.

**دووەم:** تورکمانە شیعەکان دەبێت ئەوە لەبەر چاو بگرن کە دلسۆزی‌و لایەنگیریان بۆ هاوپەیمانی عێراقی یەکگرتوو رەزامەندی بوون دەبێت لەسەر دەستووری نوێ بەو بەندەشەوە کە ئەوان رەتی دەکەنەوە لەسەر کەرکوك‌و دەستوور. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەبێت تورکمانەکان باوەریان بە توانا‌و ئارەزووی (UIA) هاوپەیمانی عێراق هەبێت بۆ تەگەرە دروست کردن یان دواخستنی جێ بە جێ کردن ماددەی (١٤٠)ی دەستووری.

**سێیەم:** هەلبژاردنە جیاجیاکانی سالی (٢٠٠٥) ئەو راستییەیان خستە روو کە ژمارەی تورکمانەکان ملیۆنێك‌و دووره لەوەی کە دوو ملیۆن یان سێ ملیۆن بێت کە بە درێژایی ماوەی سالانی رابردوو ئیدیعای ئەوەیان دەکرد. لە کاتێکدا تورکمانەکان خەریکی درۆو دەلەسە بوون لە دژی کوردەکان بۆ بە دەستهێنانی پارمەتی زیاتری تورکیا، بەلام تورکیا هەستی بەمە کردو هەلوێستی خۆی گۆری لە بەرامبەر تورکمانەکانی عێراق بە شێوەیەکی گشتی‌و هەروەها وازی لە بەرەی تورکمانی هێناو لە جیاتی ئەوە هەولەکانی خۆی چرکردەوە بۆ گەشەپێدانی کاروبارەکان لە کوردستان لە رێگەی پەیوەندییە ئابوورییەکان‌و پەیوەندییەکانی تر لەگەل سەرکردە کوردەکان. قوباد تالەبانی لە (ی.ن.ك) رایگەیاندو ووتی: (هەلبژاردنەکان ئەوەیان بە روون‌و ئاشکرایی دەرخست کە تورکمانەکان لە کەرکوکدا زۆرینە نین لە راستی دا تورکمانەکان بە ژمارەش یەکسان نین لە بەرامبەر کوردەکان داو ئەم راستییەش بەردێك بوو کە بەر تورکیا کەوت).

لە کۆتاییدا، لە دوا رۆژدا تورکمانەکان هەر مافێکیان هەبێت لە کەرکوك هەر کەمینەیەکی بچووکن‌و هیچ عێراقییەك یان هیچ زەمانەتێکی هەرێمی نییە کە شەر هەلبژێرێت‌و لەسەر تورکمان بێنە ناو هیچ شەرێك.

بۆ نموونە (ئەنجوومەنی بالای شۆرشی عێراقی) نارەزامەندی ئەوتۆی پیشان نەداوە لەسەر گێرانەوەی بارودخی کەرکوك لە چوار پارتە شیعەکانی تر. لەبەر ئارەزووی خۆیان بۆ دامەزراندی هەرێمێکی بالادەستی شیعە لە باشوور کە کۆنترۆلی بەشێکی زۆری نەوتی عێراقی دەکەوێتەوە دەست. ئەگەری ئەوە هەیە کە ئەنجوومەنی بالای شۆرشی ئیسلامی عێراقی (SCIRI) ئارەزوو بکات کە بە هاوپەیمانییەکی نەهێنی لەسەر بارودۆخی عێراق، کەرکوك لەگەل کوردەکان ئالوگۆر پێبکات. پارتە شیعییەکانی تر لەگەل ئەندامانی تورکمان بە شێوەیەکی بەربلاو دابەش‌و لاوازن‌و هەروەها ئارەزوومەند نین بە شەرکردن لەپێناو تورکمانەکانی کەرکوك هاوپەیمانی شیعە دابەش بکەن‌و لە باربەرن.

**ج. عەرەبەکان:**

سیفەتێکی گەورەی عەرەبەکانی کەرکوك ئەو راستییەیە کە ئەوان سەر بە نەتەوەی عەرەبن لە عێراق هەر لەبەر ئەوەشەکە قەت بێ پشتیوانی نابن، تەنانەت ئەو عەرەبە عێراقییە کەمانەش کە رەزامەندن بەوەی کە کورد مافی جیابوونەوەی هەبێت بەلام رازی نین ئەو جیابوونەوەیە کەرکوکی تیا بێت. پرسی کەرکوك جگە لە نێو هەندێ نێوەندی عەرەبی ئەگینا هێشتا لە دەرەوەی عەرەبەکانی عێراق نەبۆتە پرسێکی ئەوتۆ. بۆ نموونە وا پێدەچێت کە تیرۆرستەکانی کەرکوك پەیوەندییان بە سوریاوە هەبێت ئەمەش روون‌و ئاشکرایە کە سوریا بۆیە دەست وەردەداتە کاروباری کوردەکانی عێراق نەوەکو کاریگەرییان هەبێت بەسەر کوردەکانی سوریادا.

سەرکردەی بالی سەدری، موقتەدا سەدر، پشتیوانی عەرەبە هاوردەکان دەکات‌و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە

کە عەرەبە هاوردەکان مافی خۆیانە لە کەرکوك بمێننەوەو لە هەمان کاتدا هەوڵ دەدات ڕێکیان بخاتەوە. زۆربەی عەرەبە هاوردەکان کەرکوکیان جێهێشتووە بەڵام هێشتا ناسنامەو باری شارستانیان نەگواستۆتەوە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە مافی دەنگدانیان دەبێت لە کەرکوك. سەرەڕای ئەوەش، ڕاپۆرتەکان ئەوەیان پشتڕاستکردەوە کە چەکدارەکانی سەدر لە نیسانی ساڵی (٢٠٠٦)دا هاتوونەتە کەرکوك بۆ زیاد کردنی ژمارەی عەرەب‌و گەیاندنی پەیامێك بە کوردەکان کە نابێت بۆ خۆیان دەست بەسەر کەرکوکدا بگرن لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ بەڵگەیەك نییە کە ژمارەی ئەو چەکدارانە دەربخات بەڵام هەڕەشەکە ئاشکرایە، هەر کاتێك کورد جوڵەیەك بۆ کەرکوك بکات ئەوا عەرەبەکان کاردانەوەی خۆیان دەبێت.

ئەمە هۆکارێکی ترە کە بۆچی سەرکردەکانی کورد دژی پاڵاوتنی جەعفەری وەستانەوە بۆ دەست نیشان کردنەوەی بە سەرۆك وەزیران لە کاتێکدا ناوبراو پشت ئەستوور بوو بە دەنگی باڵی سەدری. لەگەڵ ئەوەشدا کە جەعفەری فشاری خرایە سەر بۆ کشانەوە لە خۆ کاندید کردنی بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران، جێگرەوەی، نوری مالیکی بە هەمان پشتیوانی هاتە مەیدان. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کورد بۆ چوار ساڵی تر دووچاری ئەگەری دڵە ڕاوکێی ئەوە دەبێتەوە کە دەبێت خشتەی پرۆسەی ئاسایی کردنەوە لە کەرکوك ئەکتیف بکرێت‌و بەشێوەیەك ڕێکبخرێت کە بەرگری بکرێت لە هەوڵەکانییان بۆ جێ بە جێکردنی پرۆسەی ئاسایکردنەوە بە باوەڕپێهێنانی عەرەبە هاوردەکان بۆ گەڕانەوەو جێهشتنی کەرکوك. سەرەڕای ئەوەش هەر لەگەڵ گەیشتنی پارتە سیاسییە کوردییەکان‌و پێشمەرگ بۆ کەرکوك لە نیسانی ساڵی (٢٠٠٣)دا سەرکردە عەرەب‌و تورکمانەکان ستراتیژییەتێکی یەکگرتوویان گرتۆتەبەر بەمەبەستی دەست وەردان لە پێشکەوتنەکانی کوردو ئەمەش بە شێوەیەکی زۆر ڕوون‌و ئاشکرا تێبینی دەکرێت لە ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك دا کاتێك کە (١٥) لە نوێنەرەکانیان لە (٤١) کورسی ئەنجومەن دا، دەبنە ڕێگر لە بەردەم کارە کارگێرییەکانی ڕاپەراندنی ئەنجومەن. ئەم بەرەیەی عەرەب‌و تورکمان زۆر جیاوازی ناوخۆییان هەیە بەڵام پشت‌و پەنان بۆ فشاری توندڕەوانە بۆ زیاتر جیاوازی مەزهبی لە هەر جێگایەکی عێراق دا.

لە ڕوانگەی یەکێك لە سەرکردەکانیان، تورکمانەکان ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینن‌و گرنگن. ئەگەر تورکمانەکان بڕیاری ئەوە بدەن کە لەگەڵ عەرەبدا بن‌و پێکەوە کار بکەن، ئەوا عێراقێکی یەکگرتوو دەستەبەر دەبێت بەڵام ئەگەر لەگەڵ کوردەکان هاوپەیمان بن لەبری عەرەب ئەوا جیابوونەوە بەر قەرار دەبێت سەرەڕای ئەوەی کە نەتەوەی زۆرینەی فراوانن لەگەڵ ئەوەشدا یان لەگەڵ هەر هاوپەیمانییەك لەگەڵ تورکمانەکان، بەڵام عەرەب پێگەی تایبەتی بەهێزی نییە ئەمەش لەبەر چەندین هۆکار:

**یەکەم:**

عەرەبە کەرکوکییەکان بەشێوەیەکی بەر فراوان لە ماوەی هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥)ی ئەنجوومەنی پارێزگادا خۆیان بە دوور گرت لە هەڵبژاردنەکان‌و سوننەکان لە (٦) شەش کورسی زیاتر نەیانتوانی کورسی تر بەدەستبهێنن‌و ئەمەش وایکرد کە توانای بڕیاری سیاسی‌و بەرەنگار بوونەوەیان نەبێت لە بەرامبەر کورد دا لە دەرەوەی ئەنجومەنەکەدا وەك بڕیاری هەڵی خزمەتگوزارییە مەدەنییەکان.

**دووەم:**

درزە ناوخۆییەکان گرنگی تایبەتی خۆیان هەیە کە لەلایەك هەموویان بە کەرکوکی ڕەسەن ئەژمار دەکرێن کە سوننەی جیاجیای تیایەو لەلایەکی تر پێکهاتووە لە عەرەبە هاوردەکان‌و زۆرینەی شیعەن‌و زۆرێك لە عەرەبە ڕەسەنەکانی کەرکوك خوازیاری گەڕانەوەی عەرەبە هاوردەکانن بۆ شوێنی پێشووی خۆیان.

**سێیەم:**

هاووڵاتییە عەرەبەکان لە دەرەوەی سنورەکانی شار بەهێزترن بە تایبەتی لە ناوچەی ڕۆژئاوادا بە شێوەیەکی سەرەکی لە قەزای حەویجە دا. لە چاوەڕوانی خۆ ڕزگار کردن لە کێشەی عەرەبەکان، ئەگەری ئەوە هەیە کە کوردەکان ڕەزامەند بن بەوەی کە ناوچە عەرەبنیشینەکان بگەڕێندرێنەوە سەر پارێزگاکانی موسڵ یان تکریت‌و سەرکردەیەکی کورد درکی بەم حاڵەتە کردووەو زەحمەتە عەرەبەکان بتوانن ئەم جوڵانەوە کوردییە یەکلایەنەیە ڕەتبکەنەوە.

**چوارەم:**

چارەسەری کێشەی عەرەبە هاوردەکان بە مانەوەیان پێ دەچێت چارەسەرییەکی لاواز بێت‌و لەوانەیە زۆریان بە قەرەبوو کردنەوە ڕەزامەندبن لە کاتێکدا ئەگەر حکومەتی ناوەندی بودجە دابین بکات، لەگەڵ ڕۆیشتنی عەرەبێکی زۆر لە کەرکوك، لەوانەیە پرۆسەی بە عەرەبکردن تەوژمێکی بە دەستەوە دابێت وای کردووە زۆر زەحمەت بێت بۆ ئەوانەی کە بڕیاری مانەوەیان دابێت بتوانن بمێننەوە.

لە کۆتاییدا، بەدەر لەو هەستە یەکگرتووەی کە لەنێوان عەرەب‌و تورکمانەکاندا هەبوو بۆ ڕووبەڕوونەوەی کورد، کە چی سەرکردە عەرەب‌و تورکمانەکان نەیانتوانیوە بگەنە ڕێککەوتنێك بۆ ئەوەی کەسێك پۆستی ئیداری جێگری پارێزگار پڕبکاتەوە (کە بە شێوەیەکی کاتی لەلایەن کورد پڕکرابوووەوە) بەڵام دوای هەڵبژاردنی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥)ەوە ئەم پۆستەیان لەلایەن کوردەوە پێشکەش کرا. سەرکردەی تورکمان، ڕیاز ساری کەهیە ڕایگەیاند ووتی: (گەورەترین کێشە ئەوەیە کە تورکمان‌و عەرەب‌و کورد متمانە بەیەکتری ناکەن. ئێمە لەگەڵ عەرەب پەیوەندییەکی باشمان هەیە بەڵام پێمان وایە پەیوەندییەکی درێژخایەن نابێت‌و ئێمە پشتی پێ نابەستین‌و تەنانەت تورکمان‌و عەرەب باوەڕ بە یەکتری ناکەن. شان بە شانی ئەوەی کە کورد بەرێگەی سیاسی نەوەك بە هێز بە دوای بەرەو پێشبردنی بەرژەوەندییەکانی خۆی دا دەگەڕێت وا چاوەڕوان دەکرێت کە کورد بتوانێت بە شێوەیەکی زۆر باش سوود لەو جیاوازییەی نێوان ئەو دوو نەتەوەیە وەربگرێت‌و بیقۆزێتەوە بۆ خۆی).

**د. كریستیانەكان:**

ئاشووری و كلدانی و سریانی و ئەرمەنی و گرووپەكانی تری كریستیانەكانی كەركوك كۆمەڵەیەكی بچووكن و رەنگدانەوەی دیمۆگرافی خۆیانن كە ژمارەیان كەمەو هێزێكی سیاسی نیشتمانی كەمینەن و هەر بۆیە زوو دەكەونە ژێر كاریگەری پەراوێزی سیاسی.

تاكە پارتی بەهێزی كریستیانەكان بزووتنەوەی دیموكراتی ئاشوورییە كە نەیتوانی لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگا لە كانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥)دا هیچ دەنگێك بە دەست بهێنێت (لە هەڵبژاردنی سەرتاسەری تەنها یەك كورسی بەدەست هێنا) تاكە كریستیان كە لە ئەنجوومەنی پارێزگای كەركوك دا هەبێت ئەوەیە كە لە لیستی كوردا هەیە، كلدان و ئاشورییەكانی دەرەوەی عێراق (بۆ نموونە لە ئەمەریكا) دەنگی نارەزاییان بەرز كردەوە لە جیاتی كریستیانی عێراق و لە كاتێكدا كریستیانەكانی ناوخۆ تەنها نیگەرانیان نیشانداو مەبەستییان نەبوو كە لەو بارەیەوە گرنگییەكی زۆر نیشان بدەن و خۆیان دەربخەن. كریستیانەكان بۆ ئەوەی قوربانی بدەن دووچاری فراندن و كوشتن بوونەوە بە هۆی ئەوەی كە لەگەڵ هێزە ئەمەریكییەكان هاوكار بوون و كاریان لەگەڵ دەكردن هەر بۆیە زۆربەی كریستیانە خاوەن پیشەكان لە بەغداو موسڵ و كەركوك بەرەو هەندەران یان بۆ هەرێمی كوردستان رایانكرد.

كریستیان وەك كەمینەیەكی بچووك لە هیچ پۆستێكی پارێزگاكەدا نین كە بتوانن روو بە رووی كورد ببنەوەو ترسی تۆڵە سەندنەوەیان هەیە ئەگەر بچنە بەرەی دژە كورد. لەراستی دا لە بەرژەوەندی كریستیانەكانە كە ببن بە هاوپەیمانی لایەنێك یان بە دوای خۆشگوزەرانی دا بگەرێن لەگەڵ هەر لایەنێك كە ئارامی و مافە سەرەتاییەكانیان بۆ فەراهەم بكات و ئەمەش لە كەركوكدا تەنها لایەنی حكومەتی هەرێمی كوردستانە كە ئەم كارەیان بۆ ئەنجام بدات.

*** فاكتەرە ئیقلیمی و نێودەوڵەتییەكان:**

كورد لە دوای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی كە لەلایەن بەریتانیا و فەرەنساوە لە بنیاتنانی دەوڵەت و بە هۆی سنووری دەستكردەوە بووە قوربانی. هەمیشە شەری گەورەی كردووە بۆ بەدەست هێنانی ئازادییەكانی خەڵكەكەی و (ئەگەر نەشیتوانیبێت سەربەخۆیی بە دەست بهێنێت) لەو چوار دەوڵەتە سەرەكییانەی كە خۆیانی تێدا بە كەمینە بنیوەتەوە وەك لە توركیا و ئێران و عێراق و سوریا. لە ئەنجامی هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی ئازادی، بزووتنەوەی كورد لە بەشە دانەبراوەكانی كوردستان بە بەردەوام هەموو تاكتیكێكی گرتۆتە بەر بەرامبەر بە حكومەتەكانی ناوەندی بۆ خۆ رزگار كردن لە ژێر ئەو ستەمەی كە لە بەرامبەریان پەیرەوی دەكەن.

زۆر شت هەیە كە ئەم چوار دەوڵەتانە لە یەكتر جیا دەكاتەوە بەڵام تەنها لەسەر یەك شت كۆكن ئەویش رێگرتن لە پێشكەوتنی كورد، هەر چەندە ئەم هەڵسوكەوتەش چەندین جیاوازی لە سیاسەتەكانی ناوخۆی ئەو وڵاتانەی لێكەوتۆتەوەو هەموویان بە چاوی گومانەوە سەیری جوڵانەوەی كوردی دەكەن و سەركەوتنی كورد لە هەر وڵاتێكی ئەم چوار وڵاتانە مەترسی تەشەنەكردنی هەیە بەسە ئەوانی تریشەوە بە تایبەتی ئەوەی ئەم مەترسییەی هێنایە ئاراوە، دروست كردنی (ناوچەی ئارام) بوو لە ساڵی (١٩٩١)دا لە باكووری عێراق كە رێگەی بۆ كوردەكان خۆشكرد كە جۆرێك لە سەربەخۆیی دەستەبەر بكەن و هەروەها دەرپەراندنی رژێمی سەدام لە ساڵی (٢٠٠٣)دا كە دەسەڵاتی دا بە كورد لە ناوچەكەی خۆیان و پایتەختی نیشتمانەكەیان بەهێزبن و لە كاتێكدا قەت كورد پێشتر ئەمەی بۆ نەگونجاوە.

كاردانەوەی ئەو وڵاتانە لە ساڵی (١٩٩١)دا گفتوگۆكردن بوو سەبارەت بەو ستراتیژییانەی كە بۆ تێكدانی ئەزموونی كوردی عێراق لە بارببوون. ئەو وڵاتانە هاوپەیمانییەتییەكیان (هاوپەیمانییەتییەكی ئەمری واقیع) لە ئەمریكا پێكهێنا كە كوردیان وەك ئامێرێك لە دژی رژێمی بەغدا بەكار هێنا لە هەمان كاتدا لە بریارداندا ئۆتۆنۆمییەكی لاوازیان پێدابوون كە بۆ هەموو پێداویستییەكی گرنگ پشتیان بە وڵاتانی تر دەبەست. بەم شێوەیە لە ساڵانی (١٩٩٠) نەوەتەكان كوردستانی عێراق جۆرێك لە پێدانی هاوكاری و پشتگیری كردنی ئاوەدانكردنەوەی گوندەكانی بە خۆیەوە بینی، بەڵام هیچ شتیك نەبوو كە ببێتە هۆی پێشخستنی سەربەخۆیی بۆ كورد.

ئامانجی كورد لەلایەكی ترەوە هەوڵدان بوو بۆ ئەوەی شان بە شانی گەشەی ئۆتۆنۆمی سیاسی گەشە بە بەرەو پێشبردنی ئابووری پشت بە خۆ بەستوو بدەن و ئەم ستراتیژییەش بووە هۆی داهێنان و پێشخستنی سەرچاوەكانی ووزە، بەڵام تەواو پشت بەستن بە دراوسێی وەك توركیا لە ساڵانی (١٩٩٠) نەوەتەكانەوە بۆ كۆنترۆل كردنی دابین كردنی پێداویستییەكان لە رێگەی تاكە سنووری پەرینەوە لە خاپوور. هەموو هەوڵەكان پوچەڵ كرانەوە، شەری ساڵی (٢٠٠٣) هەلی نوێی بە رووی كوردەكانەوە كردەوە ئەویش نەوەك تەنها بە بەهێزكردنی توانای وەبەرهێنانی نەوت و دۆزینەوەی سەرچاوە نەوتییەكان بەڵكو بە شێوەیەكی بەهێز كۆنترۆڵكردنی كێڵگە نەوتییەكانی كەركوكە.

**أ. توركیا:**

كورد هەر چی بیڵێت لە نێو كۆری گشتیدا بەلای وڵاتانی دراوسێوە كورد قەت واز لە داواكاری سەربەخۆیی ناهێنێت. ئەم وڵاتانە دەست بەسەرداگرتنی كەركوك لەلایەن كوردەوە لە دوای نیسانی ساڵی (٢٠٠٣)ەوە بە خەتی سوور دەزانن.

دژایەتی سەرەكی ئەو وڵاتانە رێگرتنە لە كورد كە ئەم دەست بەسەرداگرتنە نەبێتە جۆرێك لە رەسمی بەڵام كورد بە چەندین رێگەی جۆراوجۆر ئەم خەتەی بریوە.

ئێران و سوریا رازین كە توركیا ئەركی قورس بخاتە سەر كوردەكان. سوریا دوای ئەوەی كە كەوتە ژێر فشاری نێودەوڵەتی و دابران بە تایبەتی دوای كوشتنی سەرۆك

وەزیرانی پێشووی لوبنان رەفیق حەریری، تولنای ئەوەی نەما بتوانێت کاریگەری لەسەر ئەو پێشکەوتنانە هەبێت. هەولی سەرەکی سوریا پشتگیری کردنی چەکدارە تیرۆریستەکانە لە کەرکوك ئەویش بۆ زیاتر خۆشکردنی ئاگری ئاژاوەگێری.

ستراتیژییەتی ئێران تەنانەت پێش سالی (٢٠٠٣)ش ئەوە بووە کە کورد هەمیشە لە بەرگریکردندا ببێت ئەویش لە رێگەی پشتگیریکردنی هەندێك لە گرووپە ئیسلامییەکان و چاندنی بە کرێگیراوانی خۆیان لە ناوچەکەو بوونی هێزی ئاسایشی پاسداران و دەزگای ئیتلاعات لە باکووری عێراق بە شێوەیەکی بەرچاو و بوونی ئۆفیسی قەرارگەی رەمەزان لە شاری سلێمانی. ئێرانییەکان بەوە تاوانبار کراون کە پشتگیری دارایییان بە شێوەی ئاسانکاری و هاوکاری کردن لە پشت هێرش کردنە سەر سەرکردە کوردەکانن. سەرەرای ئەوەی کە دەسەلاتی بەغدا دەسەلاتی شیعەیە بەلام ئێران هیواخوازە کە بەرژەوەندی کورد لە بەین بدرێت.

ئەمە وایکردووەو بۆتە هۆکارێك کە تورکیا رۆلی بەرچاوی هەبێت لە دەست تێوەردانی کەرکوك. هەر چەندە ئەنقەرە داوای هیچ ناوچەیەکی عێراق ناکات لە کاتێکدا هەرێمی کوردستان وەك بەشێك لە ولایەتی موسل سەر بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوو بۆیە تورکمانەکانی ناوچەکە بە نزیك لە خۆیان دەزانن و پێییان وایە دەبێت پارێزگارییان لێ بکرێت. لە سالانی (١٩٩٠) نەوەتەکان تورکیا بەرەو رووی رەخنەیەکی کەمی کۆمەلگەی نێودەولەتی بووەو بۆ هەولەکانی لەپێناو زالبوون بەسەر بیری نەتەوایەتی کوردی لە عێراق لە رێگەی خالی سنووری خاپوور.

بەلام لابردنی رژێمی عێراقی بە شێوەیەکی زۆر سەرسورمانەوە هەموو موعادەلەکانی گۆری و تاکە سیناریۆش کە تورکیا زیاتر پێی نیگەرانە لەوەی کیانێکی بە هێزی کوردی لە باکووری عێراق بوونی هەبێت، ئەو لەبەر یەك هەلوەشانەوەی عێراقە بە هۆی ئەوەی کە ولاتەکە بۆ ئێران بە بالانسێکی ترسناك دادەنرێت، چارەسەرنەکردنی کێشەکانی دەبێتە هۆکارێك بۆ دەستێوەردانی لەلایەن ولاتە دراوسێکانەوەو دروست بوونی ناوچەیەك کە لەوانەیە بۆ چەندین سال بە ناثارامی بمێنێتەوە، وەك بەرپرسێکی بالای فەرمی تورکی خستییە روو:

(دەبێت عێراق بە یەکپارچەیی بمێنێتەوە، ئەگەر عێراق لەبەر یەك هەلبوەشێتەوە ئەوە هەموو سنوورەکانی ناوچەکە دەگۆرێن لەبەر ئەوەی ئەو سنوورانە هەموویان دەستکردن و وەك دیوار وان، کاتێك یەك بەرد لە دیوارەکە دەردەهێنیت هەموو پێکهاتەی دیوارەکە دەرووخێت).

لە سیناریۆیەکی لەو جۆرەدا، لەوانەیە بوونی کوردستانێکی بەهێز لە عێراق یارمەتیدەرێکی بێ لایەنی باش بێت لەنێوان تورکیا و سەرجەم ئەو پەشێویەی کە هەیە. بەرپرسێکی تر پێشنیازی کردو ووتی: (بوونی کیانێکی کوردی هیچ کێشەیەك دروست ناکات و ئاساییەو ئەم کیانە مەسەلەیەکی زۆر لاوەکییە لە چاو کارەساتی ناوچەکە)، کاتێك کە لەبەر یەك هەلوەشانەوەی عێراق دەبێتە هۆکارێك بۆ تووڕە بوون و هەنگاونان.

بە شێوەیەکی ووردو تەواو بۆ ئەوەی رێگری بکات لەبەردەم بوونی هەر کارێکی چاوەروانەکراو لە سنووری باشووری رۆژهەلاتی ولاتەکەی، تورکیا دەستی کردووە بە کەناگیرکردنی سەرکردە کوردەکان و بە شێوەیەکی چالاکانە هەنگاوی بەرە پێشبردنی بەرهەمهێنان و بازرگانی کردنی ناوە لەگەل هەرێمی کوردستان. ئامارێکی دروست لەبەردەست نییە بەلام راپۆرتی سالانەی بازرگانی ئەو چالاکییە بازرگانییە بە بری نێوان (٢ تا ٣) ملیار دۆلار ئەژمار دەکرێت. هەردوو فرۆکەخانەی هەولێر و سلێمانی کە وادەکات هەرێمی کوردستان کەمتر پشت بە تورکیا ببەستێت. لەلایەن کۆمپانیا تورکییەکانەوە دروست کراون. ئێستا تورکیا بۆ دووەم سنووری خالی پەرینەوە کاردەکات و پلانی راکێشانی بۆری نەوت و گازی هەیە کە راستەوخۆ لە کوردستانەوە بۆ تورکیا بروات بۆ دوورکەوتنەوە لە سنووری ئالۆزی سوننەی عەرەب. هەروەها باس لەوەش دەکرێت کە کۆمپانیایەکی نوێی دەولەتی تورکی بۆ ئیدارەدانی پیشەسازی نەوتی کوردی لە دەرهێنانەوە بۆ ناردنە دەرەوەی نەوت کاردەکات. بەم پێیە ئەگەر تورکیا پێویستی بە دەسەلاتێکی کوردی بە هێزی بێ لایەن هەبێت لە دژی لەبەر یەکترازاندنی عێراق، ئەوا دەبێت تورکیا وەك مامانێك کاربکات بۆ ئاسانکاری لە دایکبوون و باشتر وایە رێنمایی بارودۆخەکە بکات. ئەگەری ئەوەش هەیە کە ئەمە ببێتە یارمەتیدەرێکیش بۆ چارەسەرکردنی کێشەی یاخیبووانی (PKK) لە تورکیا کە کوردستانی عێراقیان بەکارهێناوە وەك تاکە بنکەیەك بۆ چالاکییەکانیان لە ناوچەی کوردەکانی تورکیا.

لەگەل ئەوەشدا هێشتا تورکیا نایەوێت کیانێکی کوردی دەسەلاتی تایبەتی هەبێت بەسەر سەرچاوە نەوتییەکانی کەرکوکدا، لەگەل هەموو ئەو ئاواتانەی تورکیا بۆ بوون بە ئەندامی تەواوی یەکێتی ئەوروپا کە بێ بەرهەم بوو (لەوە دەچێت بۆ چەندین سالی تر ئەم ئاواتە نەیەتەدی) تورکیا ترسی زۆرتری ئەوەی هەیە کە کوردەکانی خۆی پشتیوانی پەیدا بکەن لەلایەن کوردەکانی ئەو دیوی سنوور لەوەی کە سوودی چاوەروانکراو ببینێت لە بوونی بە ئەندامی یەکێتی ئەوروپا. هەروەها تورکیا بروا بە سەرکردە کوردەکان ناکات، لەسەر رووی هەموویانەوە مەسعود بارزانی، کە ووتەکانی لەسەر کەرکوك هاندان و نەگەیشتنە چارەسەرەو تورك لەو بروایە دایە کە یارمەتی (PKK) دەدات.

دەست بەسەراگرتنی کەرکوك لەلایەن کوردەکانەوە بەرێگای یاسایی یان هێز یان هەر رێگایەکی تر بێت بۆ تورکیا بە هێلی سوور دادەنرێت، ئەنقەرە بە شێوەیەکی چالاك بە رێگەی دبلۆماسییەوە کاردەکات بۆ رێگرتن لەبەردەم داخوازی کورد. بە شێوەیەکی گشتی (بۆ ئەوەی لە خراپتر دووربکەوێتەوە) لە کاتی ئێستادا خۆشحالە بە بوونی ئەمریکا لە عێراقدا وەك (هۆکارێك بۆ فشار خستنەسەر ولات بۆ ئەوەی بە یەك پارچەیی بمێنێتەوە)، تورکیا پشتیوانی لە پرۆسەی دەستووری و (سەرەرای بوونی هەندێ بۆچوونی جیا دەربارەی ناوەرۆکەکەی ) ئەنجامی چاوخشاندنەوەی

دۆکیومێنتی سەرەتایی کردووەو هەروەها پشتیوانیو پشتگیری حکومەتی نوێ دەکات بەڵام هەوڵی دەستەبەر کردنی رۆڵی بەهێزتری تورکیا دەدات بە هۆی بروا نەبوونی بە ئامانجەکانی (US)و ئەو شڵەژانەی کە لە زۆر لە هەڵەکانی واشنتۆن لە ماوەی سێ ساڵی رابردوودا دەرکەوتووەو تورکیا بە مافی تەواوی خۆی دەزانێت کە بزانێت چی لە کەرکوك روودەدات.

سەرەرای ئەوەش لۆبی نەتەوەپەرستی تورکی هەوڵ دەدەن فشاری زۆر زیاتر دروست بکەن، ئەومێد ئوزدگ (Umit Ozdag) کە سیاسەتمەدارێکی تورکە رایگەیاندو ووتی:

(دوو ملیار دۆلار لە دەستکەوتی بازرگانی برێکی کەمو بچووکە بۆ تورکیا بەڵام بۆ کورد برێکی زۆر گەورەیەو ئێمە سوودی جیوپۆلەتیکیمان هەیە لەو بارەیەوە بەڵام بەکاری ناهێنین بۆیە پێویستە سنوورەکان دابخەینو بۆری نەوت بگرینەوە. کۆمپانیا تورکییەکان نابێت لە پێشخستنی کێڵگەی نەوتی تەق تەق کاربکەن، بەم شێوەیە کورد توانای ئەوەی نابێت کە سیاسەتە نادروستەکانی بە هێز بکاتو بیچەسپێنێ.

تورکیا ئەگەر بیەوێت یاری بە کارتی تورکمان بکات لە کەرکوك، دەتوانێت زیانی بەرچاو بە بەرژەوەندییەکانی کورد بگەیەنێتو توندو تیژی بنێتەوە. بە پێی ووتەی ئەفسەرێکی سەربازی بەرزی خانەنیشنکراو، سەرەئەنجام بەوە دەکەوێتە کە کورد داهاتووی نییەو کاتێك هێزە بیانییەکان پاشەکشە دەکەن لە عێراق، کورد دەبێت بێن داوا لە تورکیا بکەن پارێزگاریان لێ بکات وەك ئەوەی لە رابردوودا روویدا. تەنانەت ئەو تورکانەش کە دۆستی کوردی عێراقن هەمان راوبۆچوونیان هەیەو پێییان وایە کە سەرکردە کوردەکان ئەم کارە دەکەن. ئیلینۆر چەڤیك رایگەیاندو ووتیك (کاتێك کە ئەمریکییەکان واز لە کوردەکان دەهێنن کوردی پێویستی زۆری بە تورکیا دەبێت).

هەڵبەتە لەبەر ئەم هۆکارەیە کە تورکیا هێمنو بێ دەنگ لە بەردەم بە خشۆکەیی دەست بەسەر داگرتنی کورد بەسەر کەرکوکدا ماوەتەوە. وا دەردەکەوێت کە کوردەکان خەریك دەکەن بەدەست هێنانی دەسەڵاتو خواستەکانیان. لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێك وا مەزەندە دەکەن کە ئیدارەی سەرۆك بۆش ئەنکەرەی دڵنیا کردبێتەوە کەس کێشەی کەرکوك بە شێوەیەك بەرێوە دەبات کە رێگە نادات کورد یەك لایەنە بەسەر کەرکوکدا جموجۆڵ بکات.

پەیوەندی ساردی واشنتۆن لەگەڵ تورکیای هاوکاریدا بەرەو هێوەر بوونەوە هەنگاو دەنێت کە لە ئەنجامی رەتکردنەوەی پەرلەمانی تورکیا بەرێگەدان بە سووپای ئەمریکا بۆ پەرینەوە بە ناو خاکی تورکیادا بۆ پرۆسەی رزگارکردنی عێراق، لە ئاداری ساڵی (٢٠٠٣)دا دروست بووە.

هەردوو وڵات زاڵبوون بە تێگەیشتنی هاوبەش لەنێوانیاندا بەوەی کە هەردوو لا پێویستیان بە یەکتر دەبێت لە روو بە رووبوونەوەی سەرهەڵدانی نا جێگری ئارامی لە عێراقو خواستە ئەتۆمییەکانی ئێران، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا کۆندەلیزا رایسو وەزیری دەرەوەی تورکیا عەبدوڵڵا گوڵ لە واشنتۆن لە تەمووزی ساڵی (٢٠٠٦)دا رێککەوتنی (Vision Statement) لێدوانی هەستەوەر ئیمزا کرد بەمەبەستی دروستکردنی پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان هەردوو وڵاتدا.

**ب. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:**

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە گشتی سەبارەت بە پرسی کەرکوك بێ لایەن وەستاوە بەشێوەیەکی سەرەکی لەبەر ئەوەی سەرقاڵە بە گرنگی گەشەپێدانی زیاتری خوارووی عێراق. ئەمریکا بە فەرمی ئەوەی خستووەتە رووکە ئەم پرسە بۆ دەسەڵاتدارانی عێراقو پرۆسەی دەستووریو یاسایی جێ دەهێڵێت.

پێش ریفراندۆمی دەستووری تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٥) راو بۆچوونی پشتگیری کردنی سرینەوەی سیاسەتی بە عەرەبکردن بوو کە ئەمەش بەو مانایە دێت کە پشتیوانیکردن لە نەهێشتنی سیاسەتی بە عەرەبکردن بە بێ فشار خستنەسەرو ناچار کردنی ئەو عەرەبە هاوردانەی کە لە ناوچە بە عەرەبکراوەکاندا نیشتەجێنو هەوڵ بدرێت بە گەشەپێدانی گشتگیری بۆ پارێزگای کەرکوك. هەندێ لە بەرپرسە ئەمریکییەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە حاڵەتێکی تایبەتی ناوخۆیی پەیرەو بکرێت بۆ کەرکوك ئەویش بە بەشداریو دابەشکردنی دەسەڵات لەنێوان پێکهاتەکاندا، لەم حاڵەتەشدا پێویستی بە ئەنجامدانی ریفراندۆمێکی مەترسیدار نابێت بەڵام ئەو بۆچوونە لە رەشنووسی دەستووردا نەخراوەتە روو، ئەمریکا لە کاتی ئێستادا پشتگیری لە ماددەی (١٤٠)ی دەستوور دکات بە ئەنجامدانی ئامارو ریفراندۆمیش بە پێی دەستوورو لە کاتی خۆیدا. بەرپرسێکی باڵای ئەمریکی رایگەیاندو ووتی: (ئێمە هیچ سیاسەتێکی تایبەتمان نییە سەبارەت بە پرسی کەرکوكو هەڵوێستی ئێمە پشتگیری کردنی بریارەکانی حکومەتی عێراقە).

لە کاتی ئێستا ئەمریکا ناخوازێت کە زۆربەی هاوپەیمانە بروا پێکراوەکانی خۆی لە بەین بەرێت، واشنتۆن بە شێوەیەکی گشتی هەڵوێستی بێ دەنگی نواندووە لە ئاست پێشکەوتنی بە کوردی کردنی کەرکوكو هەروەها بۆ کەم کردنەوەی ئەو ئاڵۆزیانەی کە بە هۆی گەرانەوەی بە کۆمەڵی ئاوارە کوردەکان بۆ شارەکە دروست بووە. ئەمریکا دەستی کردووە بە ئاوەدانکردنەوەی گوندەکانو لە هەمان کاتدا هاوکاری تەکنیکی دابین دەکاتو ناراستەوخۆ پشتگیری دارایی دەستەی داواکاری موڵکیەتی عێراق دەکات (IPCC)و کاتیك کە ئەمریکا تاوانبار دەکرێت بەوەی کە پشتیوانی بە کوردیکردنی کەرکوك دەکات. بەرپرسە فەرمییەکان وەڵامیان ئەوە بووە کە نەتەوەکانی تریش ئازاد بوون بۆ هێنانی خەڵك بۆ ناو شارەکە.

هێرشی چەکدارە یاخیبووەکان بۆ سەر هێزەکانی هەردوولا، هاوپەیمانی ئاسایشی لەنێوان ئەمریکاو کورد بە هێزتر کردووەو وایکردووە کە گیراوە گومانلێکراوەکان

لە کەرکوکەوە بگوازرێنەوە بۆ بەندیخانەکانی ناو هەرێمی کوردستان. ئەم مەسەلەیە نیگەرانی لەنێوان عەرەبو تورکمانەکانی کەرکوك دروست کردووە بە هۆی ئەوەی ئەوان زۆرترین کاریگەری ئەم هەڵمەتەیان بەر دەکەوێت.

بەڵام ئەمە جێگای گومانە چونکە واشنتۆن تا ئەو خاڵە پشتگیری لە کورد دەکات کە تا دەگاتە دووربوونەوە لە تورکیا و تا ئەو ئومێدەی کە بارودۆخی عێراق جێگیر دەبێت ئەو کاتە ئەمریکا هەوڵی بە دواداچوونی چارەسەری ئاشتی ئەدات لە کەرکوك کە بگونجێ بۆ هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکانی کوردو تورکیا و بەغدا وەك یەك کە ئەمە سیاسەتی زاڵبوونی بەرژەوەندی ئەمریکایە. کاتێك گێرەشێوێنی لە ئەنجامی دەست بەسەرداگرتنی کورد بۆ کەرکوك دروست دەبێت، وا لە ئەمریکا دەکات کە هەوڵەکانی بۆ دووبارە بنیاتنانەوەی عێراق لاواز بکات. شیکرەوەیەکی سیاسی لە واشنتۆن پێشبینی ئەوەی کرد کە (ئەمریکا هەوڵ دەدات ئەم مەسەلەیە بەلاوە بنێت چونکە ئەمە کاری سەرەکیو یەکەمی ئەمریکا نییەو ئەوان تەنها ئەوە دووپات دەکەنەوە کە ئەم کارە فەرامۆش ناکەن بەڵام مەبەستیانە کە ناچار نەکرێت هێزەکانیان لە ناچوە سووننە نیشنەکانەوە بگوازنەوەو جولەیان پێ بکەن بۆ شوێنی تر)، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ئەوەی راگەیاند کاتێك کورد هێزەکانی بەرەو کەرکوك جوڵە پێبکاتو عەرەبەکانیش لە بەرامبەریان بوەستنەوەو شەریان بکەن ئەوا هێزەکانی ئەمریکا لەوانەیە ناچار بن کە رێگری بکەن لە خوێن رشتن لەنێوانیاندا. ئەوەی ماوەتەوە روونو ئاشکرا نییە کە چۆن تێروانینی واشنتۆن دەگۆرێت کاتێك کە بارودۆخی عێراق بەلایەکدا دەکەوێت، راستی زاڵبوونی کورد وەك رێگەیەك بۆ پاراستنی کێڵگە نەوتییەکان، ئەوە بۆ تورکیا زامن دەکات کە کورد سەربەخۆیی راناگەیەنێت، باشترین کاری بە جێدەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، نەبوونی سیاسەتێکی دیار سەبارە بە پرسی کەرکوك بە کارەساتێك ئەژمار دەکرێت بیانووی پاراستنی سەروەری عێراق لەم بوارەدا تەنها فێڵێکەو دروست نییەو ئەمریکا هەمیشە ئامادەیە بە شێوەی هەوڵی دبلوماسی یان دارایی یان سەربازی هەنگاو بنێتو ئەوە بوو رۆڵێکی سەرەکی بینی لە یەکخستنەوەی حکومەتی نیشتمانی یەکگرتووی ئایاری ساڵی (٢٠٠٦)دا، ئەمە یەکەم هەنگاوی گەشەی ململانێی مەزهەبی. بەڵام لەمەودوا کەرکوك یەکەم هەوڵ دەبێت لە نێو هەموو مەسەلەکانی تردا و ئەگەر هەروا مایەوە ئەوا دەبێتە مایەی نا ئارامی لە عێراقدا، هەندێ لە نوێنەرانی عێراق بە شێوەیەکی ئاشکرا ئەوەیان خستووەتە روو کە کەرکوك پێویستی بە پشتگیری ئەکتیڤی دبلۆماسیەتی ئەمریکا دەبێتو پێویستە ئەم ئەرکەش ئێستا دەست بەکاربێت".

* سەرچاوە:-
- گۆڤاری (تێگەیشتنی راستی)، ژمارە (٧)، ساڵی (٢٠٠٧)، لاپەرە (٩ - ٥٣)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (عێراقو کورد.. شەری یەکلاکەرەوە لەسەر کەرکوك)، راپۆرتی (گرووپی قەیرانی نێودەوڵەتی - international crisis group)، وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە: عەباس مستەفا عەباس.

*** چەند سەرنجێك لەسەر راپۆرتی (عێراق و کورد: شەڕی یەکلاکەرەوە لەسەر کەرکوك):**

حەمە زیاد مەولود

"ئەم راپۆرتە دانی بە زۆر راستیدا ناوەو لە هەمان کاتیشدا غەدری گەورەی لە کورد کردووە.. راپۆرتەکە ئەم راستییە دەسەلمێنێت لەو شوێنەی کە دەڵێت:
(لە سەردەمی مەلیك دا شارەکە واتە (کەرکوك) لە زۆرینەی کوردو تورکمان و هەندێ لە کریستیان و جولەکە پێکهاتبوو).
هەروەها دەنووسێت:
(دوا بە دوای دۆزینەوەی نەوت لە (١٩٢٠) رژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق بە تایبەتی رژێمەکانی دوای ساڵی (١٩٥٨) زنجیرییەك هەڵمەتی بە عەرەب کردنیان دەست پێکرد بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی دراماتیکی دیمۆگرافی کەرکوك بگۆڕن و هەر بەم سیاسەتەش دەیان هەزار عەرەبی هاوردەیان هێنایە کەرکوك کە زۆربەیان عەرەبی شیعەی هەژارو کەم دەرامەت بوون و لە باشوورەوە هێنابوویان و لە شوێنی کەسانی تری کە عەرەب نەبوون نیشتەجێی کردن و خەڵکە رەسەنەکەشیان دەرپەراند یان بە زۆر کردیانن بە عەرەب لە رێگەی گۆڕینی ناسنامەی نەتەوایەتیان، لە نێو ئەمانەشدا کورد زۆر بە خراپی بەرکەوت و بە رادەیەکی زۆرو بەر فراوانەوە کورد کەوتە بەر هەڵمەتی راگواستن و بە تایبەت گوند نشینەکان لە ماوەی هەڵمەتی جینۆسایدی ئەنفال لە ساڵی (١٩٨٨) کەوتنە بەر شاڵاوەکە و کوشتارێکی زۆریان لێکرا).
لەم راپۆرتەدا هەر پێکهاتەیەکی شاری کەرکوك لە کورد تورکمان، عەرەب، کریستیانەکان خوێندنەوە بۆ خۆیان دەکەن و هەر لایەو لە روانگەی خۆیەوە باس لە خۆی دەکات:
(کوردەکان لە ووتارە گشتییەکانیاندا سووربونی خۆیان پیشان دەدەن کە کەرکوك بەشێکی دانەبڕاوە لە کوردستان. لە راستی دا، کورد بە دوای دەست بە سەرداگرتندا ناگەڕێت بەڵام مەبەستی گێرانەوەی هەموو ئەو ناوچانەیە بۆ سەر هەرێمی کوردستان).
دیارە کوردەکان دەتوانن ئەوە بسەلمێنن کە کەرکوك لە مێژوودا شارێکی کوردستانی بووە، بۆ ئەمەش چەندین بەڵگەی مێژوویی کۆن و نوێی حاشاهەڵنەگری لە بەردەست دایە، کەواتە بانگەشەی گەلی کورد بۆ بە کوردستانی ناساندنی کەرکوك و گێرانەوەی بۆ سەر هەرێمی کوردستان بانگەشەی بێ بناغە نییەو بە درێژایی مێژووش کورد داگیرکەری خاکی گەلانی دیکە نەبووە بەڵکو هەمیشە خاك داگیرکراوو دابەشکراو بووە.
تورکمان دەڵێن:
(نابێت کەرکوك بە هەرێمی کوردستانەوە بلکێنرێت بەو بیانووەی کە کەرکوك هیچ کاتێك بەشێك نەبووە لە کوردستان و هەروەها نایانەوێت کەرکوك لە ژێر دەسەڵاتی حوکمەتی ناوەندیش بمێنێتەوە بەڵکو خوازیاری حوکمێکی تایبەتن بۆ پارێزگای کەرکوك وەك هەرێمکی فیدراڵی).
لە راستیدا هەموو تورکمانەکان ناڵێن نابێت کەرکوك نەگەڕێتەوە سەر هەرێمی کوردستان بەڵکو بەشێك لەوان ئەو رایەیان هەیە بە تایبەت ئەوانەی سەر بە بەرەی تورکمانی کە کەوتوونەتە ژێر سێبەری قورسی راسیزمی تورکی. وەکو راپۆرتەکە خۆیشی نووسیویەتی کە (زۆربەی ئەندامەکانی بەرەی تورکمانی پێکهاتوون لە سوننە مەزهەبو لە هەمانکاتدا شیعەی عەلمانیشیان تێدایەو لەبەر ئەوەی زۆرێك لەو تورکمانانە لە داموو دەزگا ئەمنییەکانی رژێمی پێشوو لە پۆستی باڵادا خزمەتیان هەبووە بۆیە پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان هەندێك لەو ئەندامانەو چەکدارە یاخیبووەکاندا هەیە)، لێرەدا مەبەست لە چەکدارە یاخی بووەکان تیرۆیستە خۆکوژو خەڵك کوژو بێتاوانکوژەکانە. عەرەبەکان دەڵێن:
ئێمە لەلایەن ئەو کەسانەی کە سەدام ناچاری کردبوون و دەربەدەرکرابوون، ناچارنەکراوین و فشارمان نەخراوەتە سەر بۆ دەرکردن بەڵام لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٩١ -٢٠٠٣) دا رژێم (١١,٨٥٦) یانزە هەزارو هەشت سەدو پەنجاو شەش کەسی کوردی لە پارێزگای کەرکوك دەرکرد، لە روانگەی عەرەبەکانەوە، کەرکوك هەرێمکی فرە نەتەوەو تێکەڵەو رێگە نادەن سەر بە هەرێمی کوردستان بێت، بەڵام دەکرێت لە ژێر کۆنترۆڵی راستەوخۆی حکومەتی ناوەندی یان وەك هەرێمێکی تایبەتی فیدراڵی بمێنێتەوە).
لە راستیدا ئەمە رای هەموو عەرەبەکانیش نییە، خۆی عەرەبەکان زیاتر لە دەرەوەی شاری کەرکوك بە تایبەتی لە بەشی رۆژئاوادا ژمارەیان زۆرە، عەرەبەکان خۆشیان تەنانەت ئەوانەی ناونراون رەسەنیش لە ئەسڵدا رەسەن نین.
راپۆرتەکە لەم خاڵانەی خوارەوەدا هەندێ ئاماژەی نابەجێ دەداتە رای گشتیی کاتێك دەنووسێت:
(گێرانەوەی باردۆخەکە بۆ پێش سنووری ئیداری ساڵی (١٩٦٨) بارگرژی و ئاژاوەیەکی زۆری سەبارەت بە دابەش بوون لێ دەکەوێتەوەو لە وانەیە ببێتە لەمپەرێك لە بەردەم جێ بە جێکردنی هەر پلانێکی دارێژراو بۆ چەسپاندنی هێمنی و ئارامی بۆ کەرکوك. لە کۆتاییدا، داواکردن و زەروورەتی ئەنجامدانی سەرژمێری و ریفراندۆم لە کەرکوك دەبێتە هۆکارێك بۆ پشێوی دیمۆگرافی)
دیارە ئەمە دژی ماددەی (١٤٠)ە لە ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی شاری کەرکوك بە ئەنجامدانی سەرژمێریی کە لەوێدا هاتووە دەبێت سەرژمێریی لە کەرکوکدا بکرێت دوای گەراندنەوەی هاوردەکان و گێراندنەوەی دەرکراوەکان.
(مافی هاوولاتیبوون پارێزراوە بۆ هەموو کەسێك کە ژیان لەهەر شوێنێکی عێراق دا بە کەرکوکیشەوە بەسەر بەرێت).
راستە مافی نیشتەجێ بوون مافی هەموو هاوولاتییەکە، بەڵام دەوڵەت بۆی نییە بەمەبەستی سیاسی و گۆڕینی باری دیمۆگرافی دانیشتووان و راگواستنی دانیشتووانی رەسەنی شارو هێنانی عەرەب لە شوێنەکانی دیکەی عێراق بۆ کەرکوك بەم شێوەیە ناسروشتی و دیکتاتۆرییە مافی نیشتەجێ بوون بە هاوولاتییەکانی رەوا ببینێت.
(چەکدارە شەرکەرەکان وابەستەی ناوچە سەختەکانن و بە پێی مێژوو سەلماندوویانە کە لە زاڵ بوون بەسەر ناوچە

دەشتاییەکاندا لاوازن).
لەم خاڵەدا مەبەست لە چەکدارە شەڕکەرەکان (پێشمەرگە)یە. گوایە پێشمەرگە نەیتوانیوە بەسەر دەشتاییەکاندا زاڵ بێت. بەڵام هەمووان دەزانن کە پێشمەرگە هەمیشە لە کەرکوکدا بوونی هەبووەو گەورەترین چالاکییەکانی خۆیشی لەوێدا ئەنجام داوە بۆیە هەر زوو کەرکوك‌و ئەم ناوچەنە بەر شاڵاوە بەدناوەکانی ئەنفال کەوتن.

لە کۆتاییدا هەر کردارێك کە لەلایەن پارتە کوردییەکانەوە لە وەتەی گەڕاونەتەوە بۆ کەرکوك لە مانگی گوڵانی ساڵی (٢٠٠٣)وە ئەنجام درابێت یان بەپێچەوانەوە، دژ بەهەر هەوڵێك بووە کەنراوە بۆ لە باربردنی پێکەوە ژیانی ئاشتیانە لە کەرکوك.

کورد لەو ناوچانەی کە لەژێر دەسەڵاتیەتی لەو بەشەی هەرێمی کوردستان سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، ئێستا لە کوردستان دا نەتەوەیەکی غەیرە کورد نییە ستەمی نەتەوایەتی لەسەر بێت، تەنانەت ئاین‌و مەزهەبە جیاوازەکانیش بە پێچەوانەی عێراقی عەرەبی ئاشتیانە بە یەکەوە دەژین).

(زۆربەی کەرکوکییەکان سکاڵا دەکەن سەبارەت بەو پارتانەی کە لە دەرەوەی کەرکوك تەنها بەناو نوێنەرایەتییان دەکەن).
ئەمەش راست نییە، چونکە کورد و بەشێکی عەرەب و بەشێکی تورکمان پارتە کوردییەکان بە پارتی خۆیان دەزانن‌و ئەو پارتانەش لە دەرەوەی کەرکوکەوە نەهاتوون بەڵکو لەوەتەی کێشەی کورد هەیە ئەو پارتانەش لە کەرکوك بوونیان هەیەو رەگی قووڵیان داکوتاوەتە ناو جەماوەر لەم شارەدا تەنانەت چەندین سەرکردەی شەهیدیشیان هەیە. هەروەها هەر ئێستا هەزاران تورکمان‌و عەرەب ئەندامی ئەو پارتە کوردیانەن کە راپۆرتەکە دەڵێت لە دەرەوەی شار هاتوون.

(پارتە کوردییەکان هەر زوو توانیان تورکمانەکانی کەرکوك بەلای خۆیاندا کێش بکەن‌و هێناویانەتە نێو لیستی هاوپەیمانی خۆیان).
لێرەدا دەردەکەوێت کە لە راپۆرتەکەدا رای ناکۆك‌و دژ بە یەك هاتووە لەیەك دەڵێت تورکمانەکان دژ بەوەن کە بخرێنە سەر هەرێمی کوردستان لەلایەکی دیکەشەوە دەنووسێت، کە پارتە کوردییەکان توانیویانە تورکمانەکانی کەرکوك بەلای خۆیاندا کێش بکەن. چاودێرانی سیاسی کورد و خەڵکی کوردستان گلەیی ئەوەیان لە دەسەڵاتدارو پارتە کوردییەکان هەیە کە نەیانتوانیوە تا رادەیەکی باش تورکمان‌و عەرەبە رەسەنەکان بەلای خۆیاندا کێش بکەن‌و لانی کەم ئەوەیان بۆ روون بکەنەوە کە ئەگەر تورکمان بێنە سەر هەرێمی کوردستان دەبنە نەتەوەی دووەم‌و هێزێکی زیاتریان دەبێت، مانەوەی کەرکوك چ بە هەرێمێکی فیدراڵی تایبەت و چ بە مانەوەیان لەگەڵ ناوەند دەبێتە هۆی دابەش بوونی زیاتری تورکمانەکان.

(کریستیان وەك کەمینەیەکی بچووك لە هیچ پۆستێکی پارێزگاکەدا نین کە بتوانن روو بە رووی کورد ببنەوەو ترسی تۆڵە سەندنەوەیان هەیە ئەگەر بچنە بەرەی دژە کورد).
دیارە ژمارەی کەمی کریستیانەکان بووەتە هۆی ئەوەی کە نەتوانن لە کەرکوکدا رۆڵی بەرچاویان هەبێت، بەڵام ئەزموونی هەرێمی کوردستان شایەتی ئەوەیە کە کورد نەك هیچ کێشەیەکی لەگەڵ کریستیانەکان نییە بەڵکو کریستیاکانیش خۆیان رازی‌و هیچ ستەمێکیان لەسەر نییە خۆشیان لە حکومەت‌و هەرێمی کوردستان چالاکانە بەشدارن‌و کوردستانیش هەمیشە باوەشی برایەتی‌و هاوکاریی بۆیان کردۆتەوە هەر ئێستا هەزاران خێزانی ئاوارەی ناوچە عەرەب نشینەکان ئاوارەی کوردستان بوونەو بەوپەری رێزو ماف پێدانەوە مامەڵەیان لە گەڵدا دەکرێت"[*].

* سەرچاوە:-
- گۆڤاری (تێکەیشتنی راستی)، ژمارە (٧)، ساڵی (٢٠٠٧)، لاپەرە (٤ - ٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(عێراق‌و کورد: شەری یەکلاکەرەوە لەسەر کەرکوك‌و چەند سەرنجێك بۆ خوێنەران)، نووسینی: حەمەد زیاد مەولود.

*** کوردەکانی باکووری عێراق دەیانەوێ ببنە بەشێك لە تورکیا:**

"گرووپی قەیرانی نێودەوڵەتی لە راپۆرتێکدا بەناوی (عێراق و کوردەکان) باسی ئەوە دەکات کە کوردەکان خەریکە ئەمریکا لە دەستدەدەن، کە لە بەرامبەر وڵاتانی دراوسێی و عێراقدا پشتیوانی لێدەکرێت، بۆیە خەریکە روودەکەنە بەدیلێکی بابەتییانە کە ئەویش تورکیایە.

گرووپی قەیرانی نێودەوڵەتی کە بارەگاکەی لە برۆکسلەو ناوەندێکی بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەی ئەمریکییە رایگەیاندووە لە دوای سەرکەوتنەوەی پارتی (دادو گەشەپێدان) بۆ جاری دووەم کوردەکان بە پێویستیان زانیووە کە رووبکەنە تورکیاو پەیوەندییەکانی هەردوولا بە شێوەیەکی جێگر گەشەی کردووە.

لە راپۆرتەکەدا باسی بۆچوونەکانی (فوئاد حوسێن) سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی هەرێمی باکووری عێراقیش کراوە کە ووتویەتی: (ئەگەر شیعەکانی عێراق و ئێران و سوننەکانی عێراقیش دنیای عەرەبی هەڵبژێرن، ئەوا لەو چوارچێوەیەدا کوردەکانی عێراقیش پێویستیان بە تورکیا دەبێت).

لە راپۆرتەکەدا باسی ئەوەشکراوە کە هەر چەندە تا ئێستا سەرۆك کۆمار (عەبدوڵلا گول) و سەرۆك وەزیری تورکیا (رەجەب تەیب ئەردۆغان) دیداریان لەگەڵ (مەسعود بارزانی) دا ئەنجام داوە، بەڵام چەندین دیدارو کۆبوونەوەی گرنگ لەنێوان هەردوو لایەندا ئەنجامدراوە.

لە راپۆرتەکەدا ئاماژە بەوەکراوە کە دوای ئەو هەموو گۆڕانکارییانەی بیرۆکەی ولایەتی موسڵ لەلای تورکیا زیندوبووەتەوە کە (پێشتر بەشێك بووە لە خاکی عوسمانی) و ئەمەش بە پێچەوانەی جارانەوە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەرانەوە ئەمجارە بیرۆکەکە نەك لەلایەن تورکە نەتەوە پەرەستەکانەوە، بەڵکو لەلایەن کوردەکانەوە پێشخراوە.

لە راپۆرتەکەدا بۆچوونەکانی بەرپرسێکی حکومەتی هەرێمی کوردیش دانراوە کە ناوەکەی ئاشکرانەکراوە، وەها دەڵێت: (سەربەخۆیی مافی خۆمانە، بەڵام ئەگەر ئەمە نەبوو ئەو کاتە باشتروایە لەگەڵ تورکیا بین، هەتاوەکو لەگەڵ عێراقدا بمێنینەوە، چونکە عێراق وڵاتێکی دیموکراتی نییە، تاقە رێگەی چارەسەری ئەوەیە کە لە ژێر ناوی ویلایەتی موسڵدا لەگەڵ تورکیا یەکبگرین و تورکیاش کێشەی کوردەکانی ناو وڵاتەکەی چارەسەر بکات و ببێتە ئەندامی یەکێتی ئەورووپا).

(فوئاد حوسێن) سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی (مەسعود بارزانی) سەرۆکی ئیدارەی کوردی لە باکووری عێراق بە گرووپی قەیرانی نێودەوڵەتی راگەیاندووە کە ئەگەرە بە پێی لێدوانەکانی (باراك ئۆباما) ئەمریکا لەو خشتە زەمەنییە دیاریکراوەدا لە عێراق بکشێتەوە ئەوکاتە عێراق بەرەو رووخان دەچێت.

(فوئاد حوسێن) ئەوەشی ووتووە کە: (کوردەکان لە هەلومەرجێکی وەهاداو لە ژێر حیمایەی تورکیادا ئاسودەدەبن، لە بەرامبەر ئەوەشدا تورکیا لە کەرکوك و شوێنەکانی دیکەی باکووری عێراقدا بە شێوەی ناراستەوخۆ سوود لە یەدەگی نەوت و غازی سروشتی دەگرێت و بە شێوەی ناراستەوخۆ دەبێتە خاوەنی تورکیا).

گرووپی قەیرانی نێودەوڵەتی رایگەیاندووە کە تورکیاش بە شێوەیەکی وورد تێبینی و سەیری ئەو گۆڕانکارییانە دەکات کە لە ناوچەکە رووودەدەن و پشتیوانی لە سەرمایەدارانی تورك دەکات کە رووبکەنە ناوچەی باکووری عێراق.

حکومەتی تورکیا بۆ کەمکردنەوەی نفوزی ئێران بە نیازە قونسوڵخانەیەك لە بەسرە بکاتەوەو حکومەتی ناوەندی بەغدا بە هێز بکات و خوازیاری زیادبوونی کاریگەری ئێران نییە لەسەر عێراق.

حکومەتی تورکیا لە چەقبەستێکدایەو نازانێت کە ئایا دوای کشانەوەی ئەمریکا لە عێراق یارمەتی حکومەتی ناوەندی عێراق بکات و کوردەکان لە خۆی دووربکاتەوە یان بە پێچەوانەوە پشتیوانی لە کورد بکات و ناوچەیەکی قەدەغەکراو دروستبێت و حکومەتی ناوەندی بەغدا توورە بکات. تورکیا بۆ ئەوەی کاریگەرییەکانی خۆی زیاتر بکات هاوسەنگی لەنێوان هەردوولا رادەگرێت.

لە راپۆرتەکەدا باسی ئەوەکراوە کە کۆمپانییەکانی (گەنەل ئینرژی) و (پەت ئۆیل) بە چرای سەوزی ئەنقەرە لە باکووری عێراقدا دەستیان بە کارکردووەو رۆڵی (دەستی پێشەوەی تورکیا) دەگێڕن لە هەرێمی باکووری عێراقدا"[٤].

*** سەرچاوە:-**

- رۆژنامەی (ئاڵای ئازادی)، ژمارە ٨١٥، (١٥)ی تەموزی ساڵی (٢٠٠٩)، لاپەرە ١٣، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (کوردەکانی باکووری عێراق دەیانەوێ ببنە بەشێك لە تورکیا)، کە لە رۆژنامەی (میللەت)ی تورکییەوە وەرگیراوە.

*** راپۆرتەکەی جیمس بیکەرو لی هاملتۆن:**

"لە رێکەوتی (١٧)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٦)، جیمس بیکەرو لی هاملتۆن راپۆرتێکی (٧٩) خاڵیان لە بارەی کێشەکانی عێراقەوە بڵاوکردەوە، کە لە بەشێکیاندا کەرکوك و دۆخی ناوچە کێشە لەسەرەکان بە (بەرمیلە باروت) لە قەڵەم دەدات، کە ئەمە دەقەکەیەتی:



**- راسپاردەکەی بیکەر - هاملتۆن:**

١. پێویستە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەگەڵ حکومەتی عێراقی هەڵمەتێکی تازەی دیبلۆماسی گشتگیر بەر لە (٣١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٦) دەستپێبکات، لەپێناو مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکانی عێراق و ناوچەکە.

٢. پێویستی ئامانجی ئەم هەوڵە دیبلوماسییە هەرێمییە، پاراستنی یەکێتی خاکی عێراق و راگرتنی دەستێوەردان و کارە ئاژاوە گێرییەکانی وڵاتانی دراوسێی عێراق بێت، لەگەڵ ئەمەشدا پاراستنی سنوورەکان بکرێت و وڵاتانی دراوسێی عێراقیش رۆڵی هاوبەشیان تێدا هەبێت. رێگە لەململانێکان بگرێت و کار بۆ رێکخستنەوەو فراوانکردنی هاوکارییە ئابووری و بازرگانی و سەربازییەکان و پاڵپشتی سیاسیان لێ بکرێت، ئەگەر کرا، ئەم هاوکارییانە لە وڵاتانی ئیسلامی بۆ عێراق بکرێت، بەو مەرجەی لە وڵاتانی دراوسێی عێراق نەبن، هەروەها هاندانی وڵاتانی دراوسێی عێراق بۆ پاڵپشتیکردن لە پرۆسەی ئاشتەوایی عێراق بکرێت و کاراکردنی شەرعیەتی حکومەتی عێراقی لە رێگەی پەیوەندییە دیبلۆماسییەکان، هەر کاتێك کە گونجاوبێت، لەگەڵ کردنەوەی بالیۆزخانەکان لە بەغدا. هەروەها یارمەتیدانی عێراق بۆ کردنەوەی چەند بالیۆزخانەیەکی چالاك لە پایتەختە سەرەکییەکانی ناوچەکە بۆ نموونە لە (ریاز) بکرێتەوە، هاوکاریکردنی عێراق لەپێناو گەیشتن بەرێکەوتنێکی پەسەندکراو سەبارەت بە کەرکوك، هاوکاری کردنی عێراق بۆ بونیاتنانی ژێرخانێکی پتەو لەرووی ئابووری و سیاسی و ئەمنی، لەنێوانیشیاندا چاکردنەوەی شێوازی ئەنجامدانی بابەتی وەك ئاشتەوایی نیشتمانی و دابەشکردنی داهاتەکانی نەوت و هەڵوەشاندنەوەی میلیشیاکان.

٣. بۆ تەواوکردنی هەڵمەتە دیبلۆماسیەکە، پێویستە ویلایەتە یەکگرتووەکان و حکومەتی عێراق پاڵپشتی لە بەستنی کۆنگرە یاخود کۆبوونەوەیەکی رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی یان کۆمکاری عەرەبی بکەن، لەپێناو بە دەسهێنانی ئاشتەوایی نیشتمانی و بۆ گەراندنەوەی ئامادەیی دبلۆماسیان لە عێراق، ئەم هەڵمەتەش بەبێ رۆڵ و بەشداربوونی ئەم وڵاتانەی بە ئامانج ناگات، کە رۆڵیان لە رێگە گرتن لە بڵاوبوونەوەی ئاژاوە لە عێراق و هانی ئەم وڵاتانە بدرێت بۆ بەشداریکردنیان لەو هەڵمەتە.

پێویستە لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەستبەجێ کار بۆ دروستکردنی کۆمەڵەیەکی نێودەوڵەتی بکات، بۆ هاوکاریکردنی عێراق، وێرای وڵاتانی جیهان و ناوچەکە، پێویستە تەواوی وڵاتانی دراوسێی عێراق لە خۆبگرێت. هەروەها راپۆرتەکە ئاماژەی بە چەند رۆڵیکی دیاریکراوی چەند وڵاتێکی وەکو: سعودیە، میسر، تورکیا، ئوردن، کوێت، سوریا، ئێران کردووە، سەرەرای ئەو رۆڵەی هەر دوو وڵاتی ئێران و سوریا هەیانبووە، لە پاڵپشتیکردنی یاخیبوون و ملیشیاکان.

٤. پێویستە کۆمەڵەیەکی نێودەوڵەتی بۆ پاڵپشتیکردنی عێراق پێکبهێندرێت و دەستبەجێش هەڵمەتی تازەی دیبلۆماسی دەستپێبکرێت، بەوپێیەی، کە یەکێکە لە بابەتەکان.

٥. پێویستە ئەم کۆمەڵەیە لە عێراق و وڵاتانی دراوسێی بە تایبەت ئێران و سوریا و وڵاتانی سەرەکی ناوچەکە پێکبهێندرێت، کە میسر و وڵاتانی کەنداو لەگەڵ هەر پێنج وڵاتەکەی ئەندامی هەمیشەیی لە ئەنجوومەنی ئاسایش و یەکێتی ئەورووپا، دەشکرێت وڵاتانی دیکەی وەك ئەڵمانیا و ژاپۆن و کۆریای باشوور لە خۆبگرێت، کە ئامادەن بۆ بەشداریکردن لە چارەسەری سیاسی و دیبلۆماسی.

٦. دیبلۆماسیەتی تازەو کاری (کۆمەڵەی نێودەوڵەتی) پێویستە بە پەلە لە سەر ئاستی وەزیرانی دەرەوە یان ئاستی بەرزتر ئەنجامبدرێت، پێویستە وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا سەرپەرشتی بکات، ئەگەر سەرۆك نەبێت، ئەوا رەنگە هەوڵەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان دوو لایەن یاخود چەند لایەنە بێت، بەپێی خواستی بارودۆخەکە.

٧. پێویستە (کۆمەڵەی نێودەوڵەتی) لەکارەکانیدا داوای بەشداری لە نووسینگەی ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بکات. هەروەها پێویستە ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان نوێنەرێکی تایبەتی لەو کۆمەڵەیە هەبێت.

٨. بۆ مامەڵکردن لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ، پێویستە کۆمەڵێك بنەمای دیاریکراو پەرەی پێ بدرێت، بەرژەوەندی و بۆچوون و ئاراستەکانیان و بەشداری پێکردنی چاوەروانکراوی ئەو وڵاتانە بەهەند وەربگیرێت. هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئێران و سوریا لەگەڵ ئەوەی کە جێگەی ناکۆکین، بەڵام وای دەبینین هەر نەتەوەیەك لە تێروانینی دیپلۆماسیانە دەتوانێ و پێویستە لەپێناو بەرژەوەندییەکانی خۆی، لەگەڵ بەرامبەرو دوژمنەکانی خۆی ناکۆکییەکانی چارەسەر بکات،

هەر بۆیە لەسەر کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی پێویستە، ئێران و سوریا بەبێ مەرج لە گفتوگۆیە دیبلۆماسیوکان بەشدارییان پێ بکات و وادەبینرێ (کۆمەڵێك لێکۆڵینەوە لەسەر عێراق) پەیوەندی نێوان ئەمەریکا لەگەڵ سوریا و ئێران لەسەر چەند بابەتێکی قورسن، پێویستە چارەسەر بکرێت، بەڵام بە دانوستانی دیپلۆماسییانە و چرو بابەتیانە هەیە و پێویستی بە توانایەکی هاوسەنگی بەرژەوەندییەکان هەیە، لەسەر واشنتۆنیش پێویستە سوریا و ئێران بەشداری پێ بکات و هەروەك چۆن لەگەڵ لیبیا سەرکەوتنی بەدەستهێنا.

٩. ویلایەتە یەکگرتووەکان بەشێوەیەکی راستەوخۆ گفتوگۆ لەگەڵ ئێران و سوریا بکات، بۆ ئەوەی بتوانێ لە بەرامبەر عێراق و کێشەکانی ناوچەکە، لە وانە سیاسەتێکی بنیادنەر بەدەست بهێنێ. لەسەر واشنتۆن پێویستە بیر لە هاندان و سزادان بکاتەوە، بۆ ئەوەی بگاتە ئەنجامێکی ئیجابیانە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێران دەیەوێت، بەرژەوەندی ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەمەریکا لە عێراق لەناوبەرێت، پێویستە ئەمەریکا لە دوای دووبارە هاوکاری ئێرانی - ئەمەریکی لە ئەفغانستان بگەرێ بۆ ئەوەی لە عێراق جێبەجێ بکرێت.

١٠. پێویستە بەردەوامی بەوە بدرێ، کەلە رێگەی ئەنجوومەنی ئاسایش و پێنج ئەندامە هەمیشەکەی ئەنجوومەن و ئەڵمانیا، هەڵسوکەوت لەگەڵ ئێران دا بکرێت.

١١. پێویستە (کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی) لە رێگەی هەوڵە دیپلۆماسییەکان ئێران رازی بکات کە بۆ باشکردنی رەوشی عێراق چەند هەنگاوێك بهاوێژێ، لەگەڵ ئەوەی پەیوەندی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و سوریا لە ئاستێکی نزم دایە، بەرژەوەندی سوریا لە ململانێی نێوان عەرەبی - ئیسرائیلی گرنگە و دەتوانێت کار بکات، بۆیە ئەو راسپاردانە دەخەینە روو.

١٢. پێویستە سوریا لەسەر بنەمای بەرژەوەندییەکانی رازی بکرێت و هانبدرێ بۆ ئەوەی چەند هەنگاوێك بهاوێ لەوانە: چەند هەنگاوێکی دیاریکراو بۆ بەهێزکردنی سنورەکانی بگرێتەبەر، دەورییەی هاوبەشی لەگەڵ عێراق لەسەر هاوکاری سیاسی و ئابووری خۆی لەگەڵ عێراق زیاتر بکات.

بەشێوەیەکی فراوانتر لە چوارچێوەیەکی هەرێمی، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ناتوانێت ئامانجەکانی لە رۆژهەڵاتی ناوەراست بەدەستبهێنێ، ئەگەر هاتوو بەشێوەیەکی راستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ ململانێی (عەرەبی - ئیسرائیلی) نەکات، پێویستە پابەندبوونی نوێی هەبێ و بەردەوام بێت، بۆ ئەوەی ناکۆکی نێوان (عەرەب و ئیسرائیل) لە هەموو بەرەکان چارەسەربکات: لوبنان و سوریە و فەلەستین، دەبێت ئەمەریکا پەیوەست و پابەندبێت بە گفتوگۆی راستەخۆی نێوان ئیسرائیل و لوبنان و فەلەستین ئەوانەی کە دان بە بوونی ئیسرائیل دادەنێن، هەربۆ نموونە سوریا بە خاڵی سەرەکی پەرینەوەی چەك بۆ حزبوڵا دادەنرێ و هاوکاری گرووپە توندرەوە فەلستینییەکان دەکات، نابێت بەشێوەیەکی سەربازی ئەو ململانێیە چارەسەربکرێ.

١٣. پێویستە ئەمەریکا دووبارە و بە بەردەوام پابەندبێت تا بەشێوەی ئاشتیەکی گشتگیرانە لە هەموو بەرەکان ململانێی نێوان عەرەب و ئیسرائیل چارەسەر بکات.

١٤. پێویستە لە نزیکترین کات لەژێر چاودێری ویلایەتە یەکگرتووەکان یاخود لێژنەی چوارقۆلی نێودەوڵەتی داوای کۆبونەوەی بێ مەرج بکرێت، لەنێوان ئیسرائیل و لوبنان و سوریا، هەروەك چۆن لە کۆنگرەی (مەدرید) لە ساڵی (١٩٩١) لەسەر دوو ئاستی جیا ئەنجامدرا، کە یەکێکیان سوری و لوبنانی ئەوەی دیکەیان فەلەستنی.

١٥. پێویستە لەگەڵ سوریا لەمەر هەندێ مەسەلە دانووستان بکرێت، ئەمەش هاوشێوەیەکی تەواوە لەگەڵ بریاری ژمارە (١٧٠١)ی ئەنجوومەنی ئاسایش بۆ فەراهەمکردنی چوارچێوەیەك بۆ گەراندنەوەی دەسەڵاتداریەتی لوبنان، هەروەها نەك هەر بە تەنها سەبارەت بە تیرۆرکردنی رەفیق حەریری و بەیار جومەیل، بەڵکو هاوکاری تەواو بۆ بەدەسێنانی زانیاری لەمەر تیرۆرکردنی کەسایەتییە سیاسەکانی لوبنان بکرێت و هەوڵی ئەوە بدرێت، رێگە لە هاوکارییەکانی (حیزبوڵلا) بگیرێت و رێگە نەدرێت ئێران لە خاکی سوریا سوودمەندبێت، بۆ گەیاندنی چەك بۆ حزبولا، هەروەها پێویستە سوریا ئەو دەسەڵاتەی لە ناو (حیزبوڵلا) و (حەماس) هەیەتی بخاتە گەر بۆ بەردانی دیلە ئیسرائیلیەکان. بەداواداچوون لەسەر راگرتنی فشارو هەوڵەکانی سوریا بکرێت، کە بۆ پەکخستنی حکومەتی دیموکراسی هەڵبژێردراوی لوبنانی دەیدات. هەروەها رێگە لەبارە چەکییەکانی سوریا بگیرێت، کە بۆ حەماس و کۆمەڵە توندرەوەکانی دیکەی فەلەستینی دەنێرێت. هەروەها سوریا هاوکاری ئێمە بکات، بۆ ئەوەی حەماس دان بە مافەکانی بوونی ئیسرائیل دا بنێت.

١٦. لەبەرامبەر ئەم بەجێگەیاندناشدا لە رێکەوتنێکی ئاشتی گشتگیردا، ئیسرائیل بەرزاییەکانی جۆلان بگەرێنێتەوە، لەگەڵ زەمانەتدان بە ئەمەریکا بۆ پاراستنی ئاسایشی ئیسرائیل و پێکهێنانی هێزێکی نێودەوڵەتی لەسەر سنوورە، کە هێزی ئەمەریکاش تێیدا بەشداری بێت، ئەگەر هەر دوولا داوایانکرد.

١٧. سەبارەت بە کێشەی فەلەستین، پێویستە بە هەردوو بریاری ژمارە (٢٤٢) و (٣٣٨) و پرەنسیپی زەوی بەرامبەر بە ئاشتی پابەند بن. پاڵپشتیەکی بەهێزی مەحمود عەباسی سەرۆکی فەلەستین و دەسەڵاتداریەتی فەلەستنی بکرێت، بۆ گرتنە دەستی جڵەوی دەستپێشخەری و رێگەخۆشکردنی دانووستانەکانی ئیسرائیل - فەلەستین، هەوڵیش بۆ راگرتنی شەرو ئاگر بەست بدرێت و پاڵپشتیش پێشکەش بە حکومەتی یەکگرتووی فەلەستینی بکرێت، دانوستانش ساز بدرێ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی شێوەی کۆتایی تایبەت بە سنوورو جێنشینەکان و قودس و مافی گەرانەوە و کۆتایی هێنان بە ململانێکان.

١٨. زۆر گرنگە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، کە پاڵپشتیەکی زیاتری سیاسی، ئابووری، سەربازی پێشکەش بە ئەفغانستان بکات، ئەو هاوکاری و داهاتانەش لە خۆدە گرێت، کە بە کشانەوەی سوپای ئەمەریکا لە عێراق بە دەستدێت.

١٩. پێویستە لەسەر سەرۆك‌و تیمی ئاسایشی نیشمانییەکەی لە نزیکەوەو بە بەردەوام لەگەڵ حکومەتی عێراقی لە پەیوەندی دابن، ئەم پەیوەندییانەش نامەیەکی روون‌و ئاشکرا بداتە حکومەتی عێراقی، کە پێویستە تەکان بەخۆی بدات بۆ وەدەستهێنانی پێشکەوتنێکی بەرچاو.

٢٠. لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکان پێویستە ئامادەیی خۆی بۆ مەشق‌و راهێنان پێکردنی هێزە ئەمنییەکانی عێراق بە بەردەوام بخاتە روو، لەگەڵ هاوکاری‌و پاڵپشتی لێکردنی. هەروەها بەردەوامبوون لە پێشکەشکردنی پاڵپشتی سیاسی‌و ئابووری‌و سەربازی حکومەتی عێراق، چونکە چەند عێراق بەهێزتربێت لەبەرگری‌و دەسەڵاتداریەتی، ئەوا ئەمەریکا دەتوانێت هێزی سەربازی‌و مەدەنییەکانی لە عێراق کەمکاتەوە.

٢١. لە کاتێکدا ئەگەر حکومەتی عێراقی لە رێگەی ئاشتبوونەوەی نیشتمانی‌و هەوڵەکانی بە دەسهێنانی ئاسایش‌و جێگیرکردنی دەسەڵات، نەیتوانی پێشکەوتنێکی بەرچاو بە دەستبێنێت، ئەوا پێویستە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پاڵپشتی سەربازی، سیاسی ئابووری خۆی کەمکاتەوە.

٢٢. پێویستە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەوە رابگەیەنێت، کە وڵاتەکەی نایەوێت بنکەی هەمیشەیی سەربازی لە عێراق دابمەزرێنێت، ئەگەرهاتوو حکومەتی عێراقی داوای دامەزراندنی بنکەی سەربازی چ کاتی چ هەمیشەیی لە ئەمەریکا کرد، ئەوا پێویستە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەم داواکارییە بکۆڵێتەوە، وەك داواکاری هەر وڵاتێکی دیکە لە ئەمەریکا.

٢٣. لەسەر سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێویستە جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە، کە وڵاتەکەی نایەوێت دەستبەرسەر نەوتی عێراقیدا بگرێت.

٢٤. ئەو خشتە کاتییەی حکومەتی نوری مالکی بۆ هەندێك ئەرك لە کۆتایی (٢٠٠٦) یاخود سەرەتای سەرەتای (٢٠٠٧) دایناوە، بەشێوەیەکی واقعییانە نییە، پێویستە لەگەڵ هاتنی چارەکی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٧ تەواوبکرێت.

٢٥. پێویستە ویلایەتە یەکگرتووەکان لەگەڵ حکومەتی عێراقی لەسەر چەند ئامانجێکی دیکە راوێژ لەسەر بوار (ئاشتەوایی نیشتمانی، ئاسایش، باشترکردنی خزمەتگوزاری بۆ ژیانی رۆژانەی عێراقییەکان بکات)، دەبێت خشتەیەکی کاتیش بۆ جێبەجێ کردنی ئەو ئامانجانە دابنرێ.

٢٦. بۆ سەر کەوتنی ئاشتەوایی نیشتیمانی چاوخشانەوە بە دەستووری عێراقی کارێکی بنەرتییە، پێویستە ئەوکارە بەپەلە ئەنجام بدرێ. نەتەوە یەکگرتووەکان لەم بوارە شارەزاییەکی باشی هەیە، پێویستە رۆڵێکی گرنگ لەو پرۆسەیە بگێڕێ.

٢٧. ئاشتەوایی نیشتمانی دەخوازێ کە بەعسییەکان وعەرەبە نەتەوەییەکان‌و لەگەڵ دارو دەستەی سەدام بگەرێنەوە ژیانی نیشتمانی، لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێویستە هانی عێراقییە شایستەکان لە سوننەو شیعە یاخود عەرەبە نەتەوەییەکان یاخود بەعسییەکانی پێشوو یان کوردەکان، بگەرێنەوە بۆ بەشداریکردن لە حکومەت.

٢٨. دابەشکردنی داهاتی نەوت، پێویستە داهاتی نەوت بۆ حکومەتی ناوەندی بگەرێتەوەو لەسەر بنەمایی ژمارەی دانیشتووان دابەشبکرێت.

٢٩. پێویستە لە نزیکترین کات هەڵبژاردنی پارێزگاکان ئەنجام بدرێ، بە پێی دەستووری نوێ، دەبێت ئەو هەڵبژاردنانە بە شێوەیەکی کرداری بەرێوە بچێت، بۆ ئەوەی نوێنەرایەتی بۆ حکومەتی بگەرێتەوە.

٣٠. لەژێر رۆشنایی ئەو بارودۆخە مەترسیدارەی کە لە کەرکوك هەیە، پێویستی ناوبژیوانانی نێودەوڵەتی هەیە بۆ دوور کەوتنەوە لە توندوتیژی تایفی، کەرکوك لە وانەیە ببێتە بەرمیلە باروتێك، بەئەنجامدانی راپرسی لەسەر چارەنووسی کەرکوك هەروەك لە دەستوور هاتووە کە پێش کۆتایی هاتنی ساڵی (٢٠٠٧) راپرسی لەسەر بکرێت، ئەوا ئەو بەرمیلە دەتەقێتەوە، هەر بۆیە پێویستە جێبەجێکردنی دوابخرێ، دەبێت ئەو کێشەیە لە چوار چێوەی کاری دیپلۆماسیدا بخرێتە سەر خشتەی کارەکانی "کۆمەڵی نێودەوڵەتی هاریکاریکردن لە عێراق.

٣١. دەستپێشخەری لێبوردنێکی گونجاو، سەرخستنی هەر هەوڵێکی ئاشتەوایی نیشتمانی پێویستە رێگەیەکی گشتگیرانەی سەر کەوتوانەبێت بۆ ئەوەی هەموو دووژمنەکانی پێشوو لە خۆ بگرێ.

٣٢. پێویستە پارێزگاری لە مافی ئافرتان‌و هەموو کەمینەکانی عێراق بکرێت، لەوانە تورکمان، ئاشووری، یەزیدی، سابیئەو ئەرمەنەکان بگرێتەوە.

٣٣. لەسەر حکومەتی عێراقی پێویستە دەست لە بە سیاسیکردنی رێکخراوە ناحکومییەکان یاخود وەستاندنی چالاکییەکانیان هەڵبگرێ، پێویستە ناو تۆمارکردنیان تەنیا وەك کارێکی ئیداری بێت‌و نابێت چاودێریان بکات‌و یاخود دەست لە کارەکانیان وەربدات.

٣٤. دەبێت ئایندەی بوونی سەربازی ئەمەریکی لەسەر بنەمای هەوڵەکانی ئاشتەوایی نیشتیمانی بێت. تواناکان زیاتر بکرێ، بۆ بەشدارپێکردنی سەرکردە یاخی بووەکان‌و میلیشیاکان، لەگەڵ ئەوانەشدا هەوڵەکان بۆ سەرکەوتنی ئەو ئەگەرانە زیاد بکرێ.

توندوتیژی بە کۆتا نایەت ئەگەر گفتوگۆکردن دەست پێ نەکات، پێویستە گفتوگۆ لەگەڵ ئەو کەسانە بکرێ کە کاریگەرییان لەسەر دەسەڵات هەیە، لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێویستە راستەوخۆ گفتوگۆ لە گەڵ ئایەتوڵا عوزما عەلی سیستانی بکات، راستەوخۆ گفتوگۆ لەگەڵ موقتەدا سەدرو سەرکردەی میلیشیاو سەرکردە یاخیبوەکان بکات، نەتەوە یەکگرتوەکان دەتوانێ بۆ ئەم کارە ئاسان کاری بکات.

٣٥. پێویستە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەوڵێکی چالاك بدات بۆ بەشداری پێکردنی گشت لایەنە عێراقییەکان، جگە لە رێکخراوی قاعیدە، بەڵام جەخت لەسەر ئاسنامەی تایفە گەری نەکرێت، چونکە بوارێکی فراوان بۆ ئاسایشی نیشتمانی لە دەستدەدات.

٣٦. پێویستە لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکان هاندانی کۆمەڵە تایفیەکان بدات، بۆ دیالۆگ کردن، پێویستی حکومەتی عێراقیش زیاتر دەست کراوە بێت، بەرامبەر بە بڕیاری لێبوردن لە چەکداران.

٣٧. پێویستە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، چ لەلایەن دەسەڵاتداریەتی جێبەجێکردن یان شەرعی بەربەست نەبێت لە بەردەم بڕیاری لێبوردنی عێراقی.

٣٨. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێویستە پشتگیری لە بوونی شارەزایانی بێلایەنی نێودەوڵەتی بکات، بۆ راوێژکاری حکومەتی عێراقی بۆ هەڵمەتی چەك داماڵاندنی میلیشیاکانو تێکەڵکردنیان بە هێزی نیشتمانیو کۆتایی هێنان بەم پاکتاو کردنە.

٣٩. لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێویستە نووسینگەیەك لە عێراق دابمەزرێنێت بۆ پاڵپشتیکردنی مادیو تەکنیکیو هەماهەنگیو هاوکاریکردنی حکومەتی عێراقیو راوێژکارە شارەزاییەکانی لەپێناو هاوکاریکردنیان بۆ بەرنامەی چەك کردنی ئەندامانی میلیشیاکانو تێکەڵکردنیان بە هێزی ئەمنی نیشتمانی عێراق.

سوپای ئەمەریکا هیچ کارێکی بە تەنهایی نییە لە عێراق، بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن، بەڵکو ئەمە کاری هەردوو حکومەتی عێراقیو ئەمەریکییە بۆ زیاتر رەخساندنی بواری سەرکەوتنو دوورکەوتنەوە لە کارەسات، پێویستە حکومەتی عێراقی پەلە لەبەرنامەی کاری ئاشتەوایی نیشتمانیدا بکاتو هێزە ئەمنییەکانی عێراقیش بەرپرسیارێتی ئەمنی وەربگرنەوە، کە زۆر پێویستمان پێی هەیە. دەبێت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ژمارەی سەربازەکانی لەناو یەکە سەربازییەکانی عێراقی زیاد بکات، بۆ مەشقو راهێنانی سەربازانی عێراقییەکان، کە ئێستا سێ تا چوار هەزار سەربازی ئەمەریکی بۆ بەهێزکردنی سەربازانی عێراقی پەیوەندییان بە سوپای عێراقی کردووە، پێویستە ئەم ژمارەیە لە (١٠) تا (٢٠) هەزار زیاد بکرێت. هەروەها ئەرکێکی دیکەی سوپای ئەمەریکا ئەوەیە، کە هاوکاری هەواڵگریو پەیوەندیو پاڵپشتی ئاسمانی لۆجستی فیرقە سەربازییەکانی عێراقی بکات، لەگەڵ دابینکردنی پێداویستی.

لەسەر سوپای ئەمەریکا پێویستە یەکەیەکی ئامادەو تایبەت ئامادە بکات، بۆ ئەنجامدانی چالاکییە سەربازییەکانی دژ بە رێکخراوی قاعیدە لە عێراق، کاتێك کە ئەم هەلەی بۆ هەڵدەکەوێت، ئەگەر سوپای عێراقی چەكو جبەخانەی باشتری هەبێت، ئەوا دەتوانێت ئەرکەکانی باشتر ئەنجامبدات، یەکێك لەو سەرچاوانەی، کە چەكو جبەخانەکانی لێوە بەدەست دێت، ئەو چەکانەیە کە سوپای ئەمەریکا لە دوای کشانەوە لە عێراقی بەجێی دەهێڵن. بەجێهێشتنی ئەم چەکانەش خێراترین رێگەیە بۆ پڕ چەك کردنی هێزەکانی عێراقی.

ئەگەر ویلاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەموو هێزە شەرکەرەکانیشی لە عێراقی پاشەکشێ پێکرد ئەوا بوونێکی سەربازی گرنگی لە ناوچەکە دەمێنی، ئەمە جگە لەو هێزانەی کە لە قەتەرو بەحرێنو ئەفغانستان بڵاوە پێکراون. ئەم هێزانەش بوار بۆ ئەمریکا دەرەخسێنێ، کە رێگە لە دەست تێوەردانی سوریاو ئێران بگرێ.

٤٠. لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێویستە پابەندیەکی کراوەی نەبێت، بۆ هێشتنەوەی ژمارەیەکی زۆر لەو سەربازانەی لە عێراقدا بڵاویکردوونەتەوە.

٤١. پێویستە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ حکومەتی عێراقی روونبکاتەوە، ئەگەر هاتوو عێراق گۆڕانکارییە نەخشە بۆ دارێژراوەکانی جێبەجێنەکرد، ئەوا ئەمەریکا بۆی هەیە پلانەکانی جێبەجێ بکات، لەنێوانیشیاندا جێبەجێنەکردنی پلانی سەر لە نوێ بڵاوەپێکردنو جێگیرکردنەوەی سەربازان، کە پێشتر نەخشەو پلانی بۆ دارشتووە، ناشکرێت پێداویستییەکانی ئەمەریکا لە ئایندە داهاتووی سوپاکەی بکرێتە بارمتەیەك بۆ ئەنجامدانی کارە چالاکییەکانی حکومەتی عێراقیو گلبدرێنەوە.

٤٢. بە هەمان شێوەی ژەنەراڵ (جۆرج کایسی) لە (٢٤)ی تشرینی رابردووی ئەمساڵ رایگەیاندبوو، لە سەرمان پێویستە تا بەهاری (٢٠٠٨)، هەوڵبدەین بۆ تەواوکردنی مەشقو راهێنانو رێکخستنەوەی سوپای عێراقی.

٤٣. پێویستە ئەركو ئەولەویاتی سەربازی لە عێراق گۆڕانکاری تێدا بکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا بایەخی زیاتر بە مەشق وراهێنانو رێکخستنەوەی هێز بدرێت، بۆ پاڵپشتی هەڵمەتو چالاکییەکانی بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر.

٤٤. پێویستە ژمارەیەکی زیاتر لە سەربازو ئەفسەرانی شایستەی سوپای ئەمەریکا بخرێنە ناو یەکە سەربازییەکانی عێراقی.

٤٥. لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێویستە برێك چەكو جبەخانەی پێشکەش بە سوپای عێراقی بکات، بۆ ئەوەی ببێتە هاندەرێك تا حکومەتی عێراقی پەلە لە کڕینی کەلوپەلی بیانی بکات، لەگەڵ ئەمەشدا دوای کشانەوەی سوپای ئەمەریکا لە عێراق، هەندێ لەو چەكو جبەخانەی پێیانە بۆ سوپای عێراقی بەجێیبهێڵن.

٤٦. وەزیری تازەی بەرگری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەموو هەوڵێك بدات بۆ بونیاتنانی پەیوەندییەکی سەربازی ئاشتەوایی مەدەنی، بۆ رەخساندنی کەشێکی لە بار، تاوەکو بتوانرێت راوبۆچوونی ئەفسەرێکی پایەبەرزی سەربازی، نەك هەر بە تەنها لەلایەن سەرکردایەتی مەدەنی ناو پێنتاگۆن، بەڵکو لەلایەن سەرۆكو ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتمانی وەربگیرێت.

٤٧. بۆ سەرلەنوێ بڵاوەپێکردن، لەسەر سەرکردایەتی پێنتاگۆن پێویستە، بایەخ و گرنگی بە پرۆگرامی مەشقو راهێنانو رۆشنبیرکردنی ئەو هێزانەی ئەمەریکا بدات، کە بۆ ئەمەریکا گەڕاندراونەتەوە، لەپێناو سەرلەنوێ رێکخستنەوەو ئامادەکردنەوەیان بۆ بڵاوەپێکردنو چالاکییەکانی جیهانی.

٤٨. سەبارەت بە کەلوپەلە سەربازییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لەسەر پەنتاگۆن پێویستە داهاتێکی تایبەتو پێویست بۆ پێنج ساڵی داهاتوو بۆ ئامادەکاری کەلوپەکان دیاری بکات.

٤٩. پێویستە ئیدارەی ئەمەریکا لەسەر تەواوی داهاتووی شەڕی عێراقو ئەگەری رەنگدانەوەی لەسەر ئامادەکاری

هێزەکانیدا لە داهاتوو، راوێژکاری تەواو لەگەڵ لیژنە تایبەتییەکانی کۆنگرێس بکات، لەگەڵ توانای نوێکردنەوەو پارێزگاریکردن لە فەرمانبەرە شایستەکانی.

٥٠. پێویستە پۆلیسی نیشتمانی عێراقی بخرێتە سەر وەزارەتی بەرگریو یەکە تایبەتەکان ببنە بەشێك لە سوپای نوێی عێراق.

٥١. پێویستە پۆلیسی پاسەوانی سنووری عێراقی بە تەواوی بخرێنە سەر وەزارەتی بەرگری، کە بەرپرسیارەتی تەواوی کۆنترۆڵکردنی سنوورو ئاسایشی دەرەوەیان پێبسپێردرێت.

٥٢. پێویستە بۆ لێکۆڵینەوە لە تاوانەکان بەرپرسیارێتی زیاتر بدرێتە هێزەکانی پۆلیسی عێراقی، هەروەها هاوکاری پتەوی لەگەڵ دەزگاکانی دیکەی دادپەروەری عێراق هەبێت. بۆ رێکخستنەوەو کۆنترۆلکردنی تاوانەکانو پارێزگاریکردن لە عێراقییەکان.

٥٣. پێویستە وەزارەتی ناوخۆی عێراق لەسەر چالاکی گواستنەوەی رێکخستن رابهێندرێت، کە فراوانبوونی توانای یەکە سەرەکییەکانو بەرەنگاربوونەوەی تاوانو کۆنترۆڵکردنی بەشێکی هێزە پۆلیسیەکانی ناوخۆ لە خۆبگرێت، هەروەها پێویستە تەنها مووچەی پۆلیسە ناوخۆییەکان بدرێتە وەزارەتی ناوخۆ.

٥٤. پێویستە وەزارەتی ناوخۆی عێراقی هەنگاو بنێو لە ئێستاوە هەوڵی دەستنیشانکردنو تۆمارکردنی دەزگاکانی پاسەوانی دامەزراوەکان بدات.

٥٥. لەسەر وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا پێویستە بەردەوام بێت لە ئەرکی راهێنانو مەشق پێکردنی پۆلیسی نیشتمانی عێراقو پۆلیسی پاراستنی سنوور، هەروەها پێویستە پۆلیسی پاراستنی سنوور بخرێتە سەر وەزارەتی بەرگری.

٥٦. لەسەر وزارەتی دادی ئەمەریکی پێویستە بەو ئاراستەیە هەنگاو بنێت، کە ئەرکی راهێنانی ئەو پۆلیسانەی ماونەتەوە بخرێتە سەر وەزارەتی ناوخۆ.

٥٧. پێویستە ژمارەی راهێنەرە ئەمەریکییەکانی تایبەت بە مەشقو راهێنان لەناو هێزەکانی پۆلیسی عێراقی زیاد بکرێن.

٥٨. پێویستە لەسەر نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدرالی، ئەرکی لێکۆڵینەوەو دەزگاکانی لە عێراق فراوان بکات، بۆ ئەوەی بابەتی تیرۆریش بگرێتەوە.

٥٩. لەسەر حکومەتی عێراقی پێویستە دارایی پێویستو ژمارەی ئۆتۆمبیل زیاد بکاتو ئامێرەکانی پەیوەندیکردن بۆ پۆلیسی عێراق پێشبخات.

٦٠. پێویستە وەزارەتی دادی ئەمەریکی سەرکردایەتی کارەکانی رێکخستنەوەو گواستنەوەی بۆ حکومەتی عێراق بکات.

٦١. پێویستە پاڵپشتی دارایی لەو بەرنامەیە بکرێت، کە وزارەتی دادی ئەمەریکی سەرپەرشتی دەکات، بۆ دروستکردنی دادگاو راهێنانی دادوەرکانو دۆزینەوەی دەزگاو گرتنەبەری رێوشوێنی پێویست بۆ بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر.

٦٢. لەسەر حکومەتی ئەمەریکی پێویستە لە نزیکترین کاتدا هاوکاری تەکنیکی بۆ حکومەتی عێراقی فەراهەم بکات، بۆ ئامادەکردنی یاسای نەوتی عێراقی، کە مافی حکومەتە هەرێمییەکانو ناوەندی دیاری بکات.

٦٣. لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێویستە، هانی وەبەرهێنان لە نەوتی عێراقی بدات، لە رێگەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیو کۆمپانیاکانی وزەی نێودەوڵەتی.

٦٤. پێویستە هاوکارییە ئابوورییەکانی ئەمەریکی بە رێژەیەك زیاد بکرێت، کە برەکەی لە ساڵێکدا بگاتە ٥ ملیار دۆلار.

٦٥. پێویستە کۆمپانیا نێودەوڵەتییەکان بەشدارییەکی فراوانتر لە بونیاتنانەوەی عێراقدا بکەن، ئەم کارەش تەنها بە پارە بەخشین نەبێت، بەڵکو بە کارکردن بێت.

٦٦. لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێویستە سەرپەشتی بەخشینی پاڵپشتی دارایی کۆمسیۆنی باڵای کاروباری پەنابەرانو ئاژانسە مرۆییەکانی دیکە بکات.

٦٧. لەسەر سەرۆکی ئەمریکی پێویستە لە پاڵ راوێژەکارەکانی دیکە راوێژکارێك بۆ بوونیاتنانەوەی عێراق بۆ خۆی دابنێت.

٦٨. پێویستە سەرۆکی ئەمەریکا، دەسەڵاتێکی فراوانتری پێبدرێت، بۆ خەرجکردنی بڕی پارەی زیاتر لە چوارچێوەی بەرنامەی بەرپەرچدانەوەی خێرا.

٦٩. پێویستە لە ماوەی جێبەجێکردنی یارمەتیدانی عێراق، دەسەڵاتی نوێی پشکنینی گشتی بۆ دووبارە بوونیاتنانەوەی عێراق بکرێتەوە.

٧٠. پێویستە بەرنامەیەکی ساناتر بۆ یارمەتیدانی ئەمنی پێکبهێندرێتو جێبەجێ بکرێت، لەپێناو شکاندنی بەربەستەکانی نێوان دامودەزگاکان.

٧١. پێویستە دەسەڵاتی پێویست بۆ تێکەڵکردنی ئەو داهاتانەی ئەمەریکاو عێراقییەکانو کۆمەك بەخشە نێودەڵەتییەکان دەیدەن، پێکبهێندرێت.

٧٢. پێویستە لە ساڵی (٢٠٠٨)ەوە تێچوونی شەڕی عێراق، بخرێتە ناو بودجەی ساڵانەی ئەمەریکا.

٧٣. لەسەر وەزیری دەرەوەو وەزیری بەرگریو بەڕێوەبەری هەواڵگری ئەمەریکا پێویستە، ئەولەویەتی کارەکانیان بۆ راهێنانی زمانەوانیو رۆشنبیری گشتی بێت، بە تایبەت بۆ ئەو ئەفسەرو سەربازانەی لە عێراق ئەرکیان پێدەسپێردرێت.

٧٤. لە ماوەیەکی نزیکدا، ئەگەر ژمارەیەکی پێویست لە خۆبەخشە مەدەنییەکان داواکاری دامەزراندنیان پێشکەش نەکرد، ئەوا لەسەر ئاژانسە مەدەنییەکان پێویستە ئەم بۆشاییە پڕبکەنەوە.

٧٥. لە ماوەیەکی دووریشدا، لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێویستە، توانای ئاژانسەکانی باشتر بکات، بۆ سەقامگیری ئاڵۆز هاوشێوەی عێراقو ئەفغانستان.

٧٦. پێویستە وەزارەتی دەرەوە فەرمانبەرەکانی رابهێنێت بۆ گرتنە دەستی ئەرکی پەیوەندیدار بە کردەوەی سەقامگیری ئاڵۆز لە دەرەوەی باڵیۆزخانەکان.

٧٧. لەسەر بەڕێوەبەری هەواڵگری ئەمەریکیو وەزیری بەرگری پێویستە، دارایی زیاتر بۆ بواری شیکاری تەرخان

بکەن، بۆ ئەوەی هەڕەشەو سەرچاوەکانی توندوتیژی لە عێراق ئاشکرابێت.

٧٨. پێویستە لەسەر بەڕێوەبەری هەواڵگری ئەمەریکی و وەزیری بەرگری دەستبەجێ کاربکەن لەسەر گۆڕانکاری پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاری رووداو توندوتیژی و ئەو سەرچاوانەی لە عێراقدا هەن، لەپێناو ئەوەی وێنەکی روونتر لەمەڕ رووداوەکان بخەنە روو.

٧٩. پێویستە لەسەر ئاژانسی هەواڵگری (سی ئای ئەی)، ژمارەی سەربازەکانی لە عێراق زیاتر بکات، تاوەکو گەشە بە ئاژانسێکی هەواڵگری کاراو راهێنان و بوونیاتنانی ناوەندێکی بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر بکات، کە بتوانێت ئاسانکاری بۆ هەوڵەکانی نەهێشتنی تیرۆر بە سەرکردایەتی ئەم ناوەندە بدات"[1].

*** راپورتی گرووپی دیراسەکردنی عێراق بیکەر - هاملتۆن:**

ستران عەبدوڵڵا

"دەتوانین بڵێین راپۆرتی بیکەر – هاملتۆن رۆڵی سپلینگی شۆکی گێرا سەبارەت بە کوردو بزوتنەوە سیاسییەکەی. راپۆرتی گرووپی لێکۆڵینەوە لە عێراق کە بە راپۆرتی بیکەر – هاملتۆن ناسراوە نەك تەنها لە ئاستی کوردستان بەڵکو لە ئاستی عێراق، هەرێمایەتی و جیهان و لەناو خودی ئەمریکاشدا هەڵای ناوەتەوە. ئەمەش هەندێکی لە زمان و ناواخنی راپۆرتەکەو هەندێکی تریش پەیوەندی بەو هەلومەرجەوە هەیە کە لە پاش و پێشەوە دەوری راپۆرتەکەیان داوە.

زمانی راپۆرتەکە لە زۆر برگەو پەرەگرافدا زمانێکی شرۆڤەکارییە کەئەنجامدەرانی رۆڵی شرۆڤەکارییەی رەوشی عێراق دەگێڕن بۆ ئیدارەی ئەمریکا بێ نواندنی هەڵوێستێك لەو بارەیەوە. لە زۆر برگەی دیکەشدا بە تایبەتی لە راسپاردەکاندا هەڵوێست وەردەگرن و ئەو فاکتەرانە دیاری دەکەن کە رێگە چارەی (رێگەن بەرەو پێشەوە)و هانی بۆش و دامەزراوەی حکومڕانی ئەمریکا دەدەن ئەو رێگە چارانە بگرنە بەر تا لە (قوڕو چڵپاوی عێراق دەربازیان بێت. تێکەڵکردنی ئاستەکانی شرۆڤەکار)و (راسپاردەکانی چارەسەری ئیشتیباهێکی گەورەیە پەیوەندیدارانی ناوخۆیی عێراق و هەرێمایەتی بە ئەنقەست یان بێ مەبەست تێیدەکەون). بەمجۆرە هەر لە دۆسێی کوردیدا باسکردن لەوەی (زۆرینەی کوردەکان سەربەخۆییان دەوێت) جیاوازە لە داخوازی دواخستنی ریفراندۆم لە سەر کەرکوك. یەکەمیان شرۆڤەکارییە بۆ رەوشی ئارەزووی میللیی خەڵکی کوردستان کە مەیلیان بەلای سەربەخۆییەوەیە. دووەمیشیان راسپاردەیەکی هەستیارەوە ئەگەر پەسەند بکرێت کرداری سیاسیی لێدەکەوێتەوەو گۆڕان بەسەر دۆسێی کەرکوکدا دێنێت و ریزبەندییەکی تری جەمسەرە ناوخۆیی و هەرێمایەتی و نێودەوڵەتییەکانی مەسەلەی کەرکوك دروستدەکات.

شرۆڤەکردنی رۆڵی سوریا و ئێران، بۆ نمونە، جیاوازە لە راسپاردەیان بەوەی بۆش بکەوێتە گفتوگۆوە لە گەڵ دیمەشق و تاراندا. یەکەمیان بەرچاوروونییەو دووەمیشیان راوێژێکی بێ ئەمرە کە ئیدارەی ئەمریکا دەتوانێت کاری پێ بکات و کاریشی پێ نەکات.

سەبارەت بەو هەلومەرجەی دەوری راپۆرتەکەیان داوە دەکرێ بە فاکتەرەکانی چوار دەور یان ئاسۆیی و ستوونی ناویان ببەین:

یەکەمیان پەیوەندی بە باگراوندی جەیمس بیکەرەوە هەیە کە یەکێکە لە رووخسارەکانی تیمی بۆشی باوك لە ماوەی یەکەمی حکومڕانی بنەماڵەی بۆشدا.

بیکەر خۆی لە وتارێکدا بەناوی (چیتر کەس لێم ناپرسێ بۆ سەدادمان لا نەبرد) بیروڕای خۆی نیشانداوە کە لەبەر

ئەو هۆكارانەی ئێستا عێراقی ئالۆزی تێدایە لە سەردەمی بۆشی باوكدا سەدامیان لانەبرد شەڕی ڕزگاری كوێت لە (١٩٩١). نمونەی بۆشی باوك هاوپەیمانێتییەكی نێودەوڵەتی نیشاندەدا كە شەرعیەتی دەركردنی سەدامی لە كوێت پێ بوو. نموونەی بۆشی كوڕ لە ڕووخانی سەدام لە ساڵی (٢٠٠٣) هاوپەیمانێتییەكی ئارەزومەندانەی نیشاندەدا كە دوای ڕووخانی سەدام بە شوێن بڕیارێكی نێودەوڵەتییەوە بوو. دەشێ بڵێین كاری بۆشی باوك بڕیارێكی (شەرعی) نێودەوڵەتی بوو تەنانەت جەمسەرگیری سۆڤێتیش پشتیوانی لێكرد لە كاتێكدا كاری بۆشی كوڕ بڕیارێكی (شۆڕشگێرانە) بوو كە لە جەنگاوەرێك دەوشێتەوە بیەوێ گۆڕانی گەورە لە جیهاندا بكات. هەموومان دەزانین بیكەر وەزیری ئەو سیاسەتە دەركییە ئەمریكاییە بوو كە پشتی ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١)ی كوردو شیعەی بەردا لە كاتێكدا ڕەوشی ئەمڕۆی عێراق لە منداڵدانی ئەو پەیامە ئەمریكاییەوە لە دایكبوو كە پێش ڕووخانی سەدام وەزیری دەرەوەی ئەمریكا كۆلن پاول بۆ پەرلەمانی تازە یەككگرتووی كوردستانی نارد (هاوپەیمانێتی لەپێناو نەهێشتنی تیرۆریزمو بڵاوكردنەوەی دیموكراسی).

لە هەندێك جومگەی مێژوویدا كە پاوڵ بێ تاقەت دەبوو هی ئەوە بوو ئەویش یەكێك بوو لە تیمە كۆنەكەی بۆشی باوكو نەیتوانی تا سەر بربكات بۆیە لە خولی دووەمی سەرۆكایەتی بۆشی كوڕدا كۆندالیزا ڕایس جێی گرتەوە كە ئەمڕۆ یاریدەدەرەكانی توانج لە ڕاپۆرتەكەی بیكەر دەگرنو دەڵێن بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی نەوەدەكان دەشێت.

بەم شێوەیە تێدەگەین لە كاتێكدا ڕاپۆرتەكە دەیەوێ جەخت لەسەر ناكۆكییەكانی نێوان پنتاگۆنو وەزارەتی دەرەوەو (سی ئای ئەی) بكاتەوە لە هەلومەرجێكدا دیموكراتو كۆمارییەكان لە دوو سەنگەری جیاوازدان، لە باری ستونییەوە ناكۆكی نێوان دوو خوێندنگەی كۆمارییەكان دەردەخات: محافزكارە براگماتییەكانی دواساتەكانی شەڕی سارد (تیمی كۆنی بۆشی كۆن)و محافزكارە نوێیە ڕۆمانسییەكانی سەردەمی شەڕی جیهانی دژە تیرۆر (تیمی تازەی بۆشی تازە).

بۆش خۆی داوای لە تیمەكەی باوكی كردووە شتێك بكەنو ئەوانیش ئەم ڕاسپاردە (نامولزەمانەیان) داوە. قسەكانی چەند ڕۆژی ڕابردووی كۆنگرەكەی بۆش لەگەڵ بلێردا بۆنی ئەوەی لێدەهات ئەم جەنگاوەرە (شۆڕشگێرە) وا لە ڕاپۆرتی (ڕێگا بەرەوپێشەوە) دەڕوانێ كە كۆتاییەكەی بە (ئیتر بۆ دواوە) واژۆ كراوە. ڕەنگە لە ئاكامدا گوڵبژێرێك لە ڕاسپاردەكان هەڵبژێرێت. ئەمەش مەسەلەیەكە هەلومەرجی دەورووبەری ڕاپۆرتەكە تەحەكومی پێوە دەكەن كە هەلومەرجی دەربازكردنی ئەمەریكایە لە قوڕو چڵپاوی عێراق جا با ئیتر عێراق چی لێدێت با لێی بێت: دەكەوێتە ناو دەمی نەهەنگی تیرۆرەوە، یان سیاسەتە تەقلیدییەكانی ناوچەكە ئاراستەی دەكەن؟ دەبێتە دۆزەخ بۆ ڕۆڵەكانی یان ئەویش جارێكی تر تەماهی لە گەڵ ئیستیبدادی ڕۆژهەڵاتییدا دەكاتەوە؟ لە هەموو تەنگەژەیەكی ڕۆڵی جیهانی ئەمەریكادا، لە هەموو دووریانێكی ڤێتنام ئاساو عێراق ئاسادا، دوو جمكە ئەمەریكاییەكە سەرهەڵدەدەنەوە: داكۆكی لە بەها ئەمەریكاییەكانی وەكو دیموكراسیو دادو ماف مرۆڤ بكرێت یان داكۆكی لە بەرژەوەندییە موجەرەدەكان؟ بۆش خۆیو نزیكەكانی دەزانن دوو سەری ئەم دوو هنداڵە سیامییە لێدەكرێتەوە، یان دەورانێكی تریش پێكەوە هەڵدەكەن؟ ئەمەش پابەندی ئیرادەی ئەم جەنگاوەرەی ڕزگاری عێراقە هەر وەك چۆن پابەندی ئەو هەلومەرجە دژوارەشە كە ئێستا لە عێراق هەیەو كاتی خۆی ڕێی لە بۆشی باوك گرت بێت بەغدا بگرێت. هەروەكو سەركردایەتی كوردستانو عێراقیش وەكو بۆش دەتوانن بەو جۆرەی ئارەزوو دەكەن لەگەڵ ڕاسپاردە نامولزەمەكانی بیكەر – هاملتۆندا مامەڵە بكەن، بەڵام ئەمەش پابەندێ ئەندازەی قودرەتمەندی سەركردایەتی كوردستانو سەركردایەتی عێراقە كە چۆن دەتوانن كێشەكانی كوردستانو عێراق دوور لە ڕاسپاردەكانی بیكەر چارەسەر بكەن؟

ئەم پیاوە كلاسیكییەی ناوی بیكەرە خۆی نەهاتووە، بۆش ناردویەتی بە شوێنیدا دوای ئەوەی هاوپەیمانە عێراقییەكانی لە هەڵبژاردنەكانی كۆنگریسدا هیچ دیارییەكی گران بەهایان بۆ نەنارد بۆنی سەركەوتنی لێبێت. بیكەر وەك هەر خانەنشینێكی مولتەزیم لەماڵەوە باخچەكەی پشتەوەی ئاو دەدا كە زەنگیان بۆ لێداو پێیان وت:

پێویستمان بە یارمەتی تۆ هەیە. ئەو هەر ئەوەندەی لێ دەزانێت لێ ئیختیار لە بەردەم سوارچاكە ناوخۆییو هەرێمیو ئەمەریكاییەكانی ئەم سەردەمەدایە كە بەچ قودرەتمەندییەك ڕێگای بەرەو پێشەوە دەبڕن نەك بەرەو دواوە.

*** لە ڕاپۆرتەكەدا هاتووە:**

چوار لە (١٨) پارێزگاكەی عێراق زۆر نائارامن، بەغداد، ئەنبار، دیالەو سەلاحەدین، ئەم چوار پارێزگایە نزیكەی لە سەدا (٤٠)ی (٢٦) ملیۆن دانیشتووانەكەی عێراق پێكدەهێنن. لە بەغداد توندوتیژیی بەزۆری لەنێوان سوننەو شیعەدایە، لە ئەنبار توندوتیژیی دەگەڕێتەوە بۆ یاخیبوونی سوننەو ئەلقاعیدەو بارودۆخەكە بەرەو هەڵدێر دەڕوات.

لە كەركوك ململانێكە لەنێوان كوردەكان، عەرەبەكانو توركمانەكاندایە. لە بەسرەو باشوور، توندوتیژیی بە زۆری ململانێی ناوخۆی شیعەیە. هەرە سەقامگیرترین بەشەكانی عێراق سێ پارێزگاكەی باكووری كوردییو بەشەكانی باشووری شیعەیە، لەگەڵ ئەوە زۆربەی شارەكانی عێراق لەڕووی تائیفیەوە تێكەڵنو بە توندوتیژی بەردەوام تەنراوەن.

*** دابەشكردنی دەسەڵات بۆ سێ هەرێم:**

زیانەكانی یەكانگیر لەگەڵ دابەشكردنی عێراق بۆ سێ هەرێمی نیمچە ئۆتۆنۆمی بەدەسەڵاتێكی مەركەزیی لاوازەوە، زۆر گەورە دەبن. لەبەر ئەوەی دانیشتووانی عێراق بەشێوەیەكی مەحكەم دابەش نەبوون، ناتوانرێت بەئاسانی

سنووری هەرێمایەتی بکشرێت هەر (١٨) پارێزگاکەی عێراق دانیشتووانی تێکەڵاویان هەیە، وەکو بەغدادو زۆربەی شارە گەورەکانی تری عێراق دابەشکرنێکی خێرا رەنگە جموجۆڵێکی بەکۆمەڵی دانیشتووانی بەدواوبێت ببێتە هۆی هەرەسهێنانی هێزەکانی ئاسایشی عێراق بەهێزبوونی میلیشیاکان پاکتاوی لەزادیی نائارامکردنی وڵاتانی دراوسێ، یا هەوڵەکانی وڵاتانی دراوسێ بۆ کۆنترۆڵکردنی هەرێمەکانی عێراق.

عێراقییەکان بەتایبەت عەرەبە سوننەکان پێیان وتین دابەشکردنێکی لەو جۆرە ئەو ترسە فراوانانە دەسەلمێنێ کە لە سەرتاسەری جیهانی عەرەبیدا هەیە لەوەی ئەمریکا عێراقی بۆ ئەوە داگیرکرد تا دەولەتێکی بەهێزی عەرەبیی لاواز بکات لە کاتێکدا ئەو جۆرە دابەشکردنە سەرەنجامێکی مومکینی نائارامیی بەردەوامە لە عێراق، ئێمە بروامان نییە کە پێویست بێ ئەمریکا پشتیوانی ئەم رێبازە بکات. وەك ئامانجێکی سیاسەت یا ئەم ئامانجە بەسەر دەولەتی عێراقدا بسەپێنێ. ئەگەر رووداوەکان بەبێ ئاوەژووکردنەوەیان بەم ئاراستەیەدا برۆن، پێویستە ئەمریکا بارودۆخ بەرێوەبەرێت بۆ باشکردنی سەرەنجامە مرۆییەکان، تەشەنەکردنی توندوتیژی پەکبخات و نائارامیی هەرێمایەتی کەم بکاتەوە، پێویستە ئەمریکا ئەوەندی پێیدەکرێت پشتگیریی بکات لە کۆنترۆڵی ناوەندیی لەلایەن دەسەڵاتدارانی حکومییەوە بەتایبەت لە مەسەلەی داهاتەکانی نەوتدا.

کەرکوك بەزانینی ئەو بارودۆخە زۆر مەترسیدارەی لە کەرکوکدا هەیە. چارەسەرێکی نێودەولەتیی پێویستە بۆ خۆلادان لە توندوتیژیی ناوخۆیی. پێکهاتەی تێکەڵی دانیشتووانی کەرکوك لە کوردو عەرەب و تورکمان دەکرێت بیکاتە بەرمیلێك باروت. سازکردنی ریفراندۆم لەسەر ئایندەی کەرکوك وەکو ئەوەی لە دەستووری عێراقیدا داواکراوە (پێش کۆتایی ٢٠٠٧) دەبێت و پێویستە دوابخرێ. ئەم مەسەلەیە پێویستە لە بەرنامەی کاری گرووپی نێودەولەتیی پشتیوانیی عێراق دابنرێ وەك بەشێك لە هەلمەتی نوێی دیبلۆماتیی"[٢].


* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١. (کەرکوك و گەمەی رێککەوتنەکان، پانۆرامای کەرکوك و مادەی ١٤٠، ٢٠٠٢ - ٢٠١١)، کۆکردنەوەو ئامادەکردن: عەلی فەتاح مەجید، بەرگی یەکەم، چاپخانەی (پەیوەند)، سلێمانی، ٢٠١٣، لاپەرە (٩٤ - ١٠٨).

٢. (راپۆرتی گرووپی دیراسەکردنی عێراق، بیکەر - هاملتۆن)، وەرگێرانی: جەمیل عەلی، دانا حەمید، عەزیز رەئوف، چاپخانەی (دلێر)، سلێمانی، ٢٠٠٧، لاپەرەی جۆراوجۆر.

## * بابلیۆنێکی لێکترازاو:

جۆست هیلتەرمان
وەرگێڕان: کۆشان زەمانی و عەبدوڵڵا حەوێز

"چارەنووسی عێراق لەوانەیە بەرەو ئاراستەیەکی باشتر یاخود خراپتر بڕوات بە هۆی کەرکوکەوە کە تیایدا هەریەك لە کورد، عەرەب، تورکمان و کریستیانەکان کێبەرکێی یەکتر دەکەن، بۆ ئەوەی کۆنترۆڵ بەسەر شارەکەو سەلامەتی هاووڵاتیانیان بکەن.

سەرچاوە نەوتییەکانی ئەو ناوچەیە دەوڵەمەندە بە نەوت کە دەکەوێتە سنووری نێوان هەریەك لە کوردو عەرەبەکان وەك خەڵاتێك وایە بۆ ئەو هێزەی دەستی بەسەردادەگرێت، هەروەك ئەو هێزانەی کە لە بەغدان شەڕ بۆ ئەوە دەکەن کە ئەو ئاشتییە پێنەگەیشتووەی کە لە دوای جەنگی ناخۆییەوە بەدی هاتووە بپارێزن، دانیش بەوەدادەنێن کە چارەنووسی سیاسی کەرکوك ئەوەندە ترسناکە کە ئەو وڵاتە پارچە پارچە بکات.

لە ماوەی داهاتوو، جەنگ بە شێوەیەکی بەرفراوان ڕوودەدات لەو دراما سیاسییە کۆتایی نەهاتووە، بەڵام ئەگەر لایەنەکان نەگەنە ئەنجامێکی مامناوەند کە هەموو لایەك پێیرازیبێت. ئەوا لەوانەیە هەنگاوی داهاتوو جەنگێکی خوێناوی بێت.

بۆ یەکەمجار من لە مانگی نیسانی ساڵی (١٩٩١) سەردانی ئەو شارە عێراقییەم کرد، لە بەغداوە بە ئۆتۆمبێلی یەکێك لە ئاژانسە نێودەوڵەتییەکانی مافی مرۆڤ بەرەو کەرکوك هاتین. لەو کاتدا، من وەك ڕاوێژکار بۆ ئاژانسێکی مافی مرۆڤ کارم دەکرد کە گرنکی بەلایەنی جەستەیی مرۆڤەکان دەداو بارەگای لە شاری بۆستن بوو، کارمان هەڵسەنگاندنی مەرجە مەدەنییەکان بوو لە کاتی جەنگی نێوان عێراق و کوێت کە ئەمریکاش بەشداری تێداکرد.

من زیاتر لەوەی کە پێیان سپێردرابووم هەڵسەنگاندنم کرد. ڕژێمی پێشووی عێراق تازە ڕاپەڕینی باکوورو باشووری کپ کردبوو کە لەلایەن ئیدارەی (جۆرج بۆش)ی باوك پارەدار کرابوون و بەڵێنی پاڵپشتی و هاوکاریان پێدرابوو، بەڵام کۆشکی سپی هەرزوو لە بەڵێنەکەی پەشیمان بووەوەو هەڵسوڕێنەرانی هەردوو ڕاپەڕینەکەیشی جێهێشت بۆ ئەوەی بۆ خۆیان ڕووبەڕووی تووڕەیی ڕژێمی سەدام حوسێن ببنەوە.

نیشانەکانی ئەم جەنگە بە هەموو ئەو شوێنانەی عێراقەوە دیاربوون کە من بۆی ڕۆیشتم. دوکانەکانی ناوەڕاستی کەربەلا دەسووتان لەگەڵ بۆردومانی تانکەکان ڕووکاری مزگەوتی عەباسیان لەنزیك ئەو شوێنە تێکشکاندبوو. لە بەسرا، پیاوەکانی ڕژێم چەندین پارتی دژە فرۆکەیان لە شەقامەکان بڵاوە پێکردبوو، واش ڕاهێنرابوون کە هەمیشە دەستیان بەسەر چەکەکانەوە بوو لە سەرانسەری وڵات نیشانەی ئاگری ڕۆکێت بەسەر دامەزراوە حکومییەکانەوە دیاربوو، هەروەها نیشانەی ترسناك بەسەر دەرمانخانەو نەخۆشخانەکانەوە، لەگەڵ چیرۆکی لاشە مردووەکان کە بەشێوەی زۆر فراوان لەسەر شەقامەکان کەوتبوون و منداڵانیش لە لانکەکانیان لە حاڵەتێکی خراپ دابوون، هەروەها لە تینوییا خەریکبوو دەمردن، شوێنەکانی هەڵگرتنی ئاوو وێستگەکانی وەبەرهێنی کارەبا ببوونە بەشێك لە دیمەنی بۆردومانکردن بە تانکەکان.

لە باکوور، بە هۆی بۆردمانی هێلیکۆپتەرەکانەوە ئەو عەرەبانەی کە لەلایەن ئەو کوردانەوە دەهاژوشترا کە ڕایانکردبوو لەسەر ڕێگای ئێران سەراوژێربیبون. لە سلێمانی لە باکووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان کۆمەڵێك لەو ئاوارانەی کەلە سنوورەکانی ئێرانەوە گەڕابوونەوە بەهۆی مینەوە برینداربیون ولە نەخۆشخانەی حکومی چارەسەریان بۆ دەکرا. هەروەها لە هەڵوێستێکی شەیتانیانە وەك تۆڵەکردنەوەیەك لە دژی هەڵسانەوەی چەکدارە کوردەکان لە دژی حکومەتی بەغدا، من بینیم کە دوو سەربازی عێراقی لە بنکەیەکی پۆلیس بەسەرەوژێری دەست و پێی پێشمەرگەیەکی کوردیان بەستبوویەوە. شەو لە شوێنێکی ڕێژەیی بێلایەن ماینەوە.

نەخۆشخانەی حکومی (ئێمە بەشێوەی ڕێککەوتن داوودەرمانی کەسیمان دۆزیەوە بۆ ئەوەی بەشێوەی سیاسی و بەشێوەی خێرا بیگەیەنینە ئەو شوێنانەی پێویستییەکی زۆریان پێیەتی). لەوێ، بەهۆی هەندێ کارکەری میسریەوە ڕێنوێنی کراین و توانیمان زانیاری زۆری بەسوود لە حاڵەتە لۆکاڵییەکە کۆبکەینەوە.

هەر لەو ڕۆژەو دواتر، هەروەك ئێمە لە سلێمانی گەڕابووینەوە، ئێمە بەناوچەی شۆڕیجە تێپەڕین، یەکێك لە شارۆچکە کوردی نشینەکانی نزیك کەرکوك. بلدۆزەرەکان خانووەکانیان دەڕووخاند، کەرپوچەکانیان لە ژێرییەك دەردەهێنا. ڕژێم دانیشتووانی ئەو ناوچەیەی سزا دەدا بەهۆی بەشداریکردن و پاڵپشتکردنی چەکدارەکان دوای چەند ڕۆژێك کوردەکانی لە شارەکە ڕاگواست و خانووەکانی تێکشکاندن. هەروەك من دواتر لە ناردنی سەربازەکان بۆ عێراق فێربووم، ئەمە زیاتربوو (باشتر نەبوو) لە تۆڵەسەندنەوە. ئەمە دوائەڵقەی ئەو زنجیرەیەبوو کە هەوڵی شەیتانی دەدرا بۆ گواستنەوەی دابەشبوونی دانیشتووان لەسەر بنچینەی ئیتنی. هەتا ئەمدواییە، خەڵکێکی زۆر لە دەرەوەی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست گوێبیستی شاری کەرکوك نەببوون لە باکووری عێراق.

یەکێك لە ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە دووربووە لە ناوچە فرە نەتەوەکانی وەك موسڵ و بەغدا، بۆ ماوەیەکی درێژ ئەو ناوچەیە لەلایەن چەندین گرووپ و نەتەوەوە بەڕێوە دەبرا – ئاشووری و کلدانییەکان (کە دوو کەمینەی کریستیانن)، لەگەڵ تورکمانەکان و کوردەکان و عەرەبەکان – بەیەکەوە لە ژینگەیەکی خزمانەی توندوتۆڵ دەژیان، ژن و ژنخوازی لەنێوانیان هەبوو، بەشێوەیەکی فراوان دەیانتوانی بەزمانی یەکتر قسەبکەن. دۆزینەوەی نەوت لە کۆتایی ساڵی (١٩٢٠) ئەو ناوچەیەی گواستەوە بۆ شوێنێك کە وەك موگناتیس بۆ کۆکردنەوەی خەڵکی هەژار،

لەوانەش کۆمەڵێك کوردی شاری هەولێر کە ئێستا پایتەختی کوردستانی عێراقە، هەروەها سلێمانی کە بەیەکەوە لە ناوچەی کێڵگە نەوتییەکان لە سێ دەیەی یەك بەدوای یەك کۆببونەوە.

جەنگی تائیفی زۆر بەخێرایی دەرکەوت. کوردەکان لە چیاکان زنجیرەیەك هێرشی سەرنەکەوتیان ئەنجامدا لە دژی حکومەتی عێراقی لە سالآنی (١٩٣٠) یەکان و (١٩٤٠) ەکان، دواتر پاڵەپەستۆ خرایەسەر سەرکردەکانیان بۆ ئەوەی رابکەن بۆ یەکێتی سۆڤیەت و ئێران. ئەوە بەردەوام بوو تا ساڵی (١٩٥٨) کە تیایدا کوودەتای سەربازی روویداو بەهۆیەوە بەریتانییەکان لە عێراق کشانەوەو رژێمی پاشایەتی رووخاو ورژێمێکی عەرەبی ناسیۆنالیست جێگەی گرتەوە، ئاراستەی سیاسی ناوەندیش گۆڕاو بەمەش چەندین دەیە لە جەنگ راوەستا.

چەکدارە کوردەکان، کە ماوەیەکی زۆر لەگەڵ حکومەتی ناوەندی لەپێناو ئۆتۆنۆمی دەجەنگان، لە مەنفا لە ئێران گەرانەوە وەك پەرچەکردارێك بۆ نەمانی ئاراستە سیاسییەکەی پێشوو، بەڵام هەرزوو خۆیان دۆزیەوە، دووبارە، ئۆپۆزسیۆنی دەسەڵاتی بەغدا بوون. شۆرشەکانیان لە سەرەتای شەستەکان شکستی هێناو بەهۆیەوە کوردەکان باجێکی زۆریان بە ژیان و خۆشگوزەرانیان دا. هەر ئەو کاتەبوو کە رژێمی کۆماری عێراق دەستیکرد بە بەعەرەبکردنی ناوچەکانی دەورووبەری کێڵگە نەوتییەکان، نەك تەنها لە کەرکوك، بەڵکو بەدرێژایی ئەو ناوچانەی دەکەونە سنووری سوریا لە باکوری رۆژئاوا تا ناوچەکانی رۆژهەلاتی نزیك بەغدا لە سنووری ئێران. دوای ئەوەی رژێمی بەعس هاتە سەرحوکم لە ساڵی (١٩٦٨)، دەستیکرد بە گفتوگۆکردن لەگەڵ سەکردەی چەکدارە کوردەکان (مەلا مستەفای بارزانی)، ئەویش توانای کاتی و بەهێزی خزمایەتی بەکارهێنا بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین دەستکەوت: دروستکردنی هەرێمێکی خۆجێیەتی کوردی، بەڵام هەردوولا رێککەوتنامەی ئۆتۆنۆمیان و شێوەی ئەم هەرێمە ئۆتۆنۆمیەیان بەشێوەیەکی جیاواز شیکردەوە، لەگەڵ کەرکوك کە بەشێکبوو لە کێشەکە، هەر بۆیەش رێککەوتنەکە هەرزوو شکستی هێنا.

کوردەکان گەرانەوە بۆ خەباتی چەکداری و رۆژی دەستپێکردنەوەی شەر زۆر بەخێرایی هات. رژێمی عێراق زۆر رقیبوو لە تەسلیمکردنەوەی کۆنترۆڵی کەرکوکی دەوڵەمەند بە کێڵگەی نەوتی (کە نزیکەی ١٥ ملیار یان ١٣٪ی نەوتی عێراقی لێیە کە کۆی گشتی ١١٥ ملیار بەرمیلە) لەگەڵ کانی هایدرۆکاربۆن کە وەك بەردی گەورە وان لە ژێر پێدا.

هاوپەیمانی کوردەکان، شای ئێران و ئیدارەی فۆرد، پاڵپشتی خۆیان بۆ چەکدارە کوردەکان کشاندەوە بەمەش لە ساڵی (١٩٧٥) پوکانەوە، بەڵام نەك پێش گۆرینی هیوای درێژخایەنی کوردەکان بۆ ئەوەی رۆژێك لە رۆژان کەرکوك ببێتە بەشێك لە کوردستانی سەربەخۆ. دواتر هەرزوو چەند دانیشتنێکی دوورودرێژ لەلایەن کوردەکان و بەغدا بەدوایداهات. بۆ چەند ساڵێك، سەدام حوسێن بەشێوەیەکی توند دەستیکردەوە بە بەعەرەبکردنی ناوچەکە بە پێشکەشکردنی پارە بەخەڵکی بۆ ئەوەی شوێنی نیشتەجێبوونیان بگۆرن، ئابلوقەی دەخستەسەریان و شوێنی کارکردنی دەگواستنەوەو خەڵکی لە ناوچەکانیان بەدەردەنا بەبیانووی یاسایی، تەنانەت نەتەوەی خەڵکیشی دەگۆری بەناوی (راستکردنەوەی نەتەوەیەیی).

لە ساڵی (١٩٨٨)، دوا ساڵی شەری نێوان عێراق و ئێران، بەعەرەبکردن شێوەی تری وەرگرت ئەوەیش بە رێکخستنی ئۆپۆراسیۆنی سەربازی بۆ لەناو بردنی چەکدارە کوردەکان کە ناوی لێنابوو ئەنفال، لەگەڵ ئەوەی ئۆپۆراسیۆنێکی سنووردار نەبوو، بەڵام توندترین شاڵاو لە ناوچە کشتوکاڵییەکانی کەرکوك بوو. لەماوەی شەش مانگدا، رژێم بەشێوەیەکی رێکخراو دەیان هەزار کەسی لە کوردە لادێ نشینەکان کوشت، زۆرێکیشی راگواست بۆ نشینگەی زۆرەملێ و خانووەکانی رووخاندن.

ئەوەی من بینیم لە کەرکوك لە نیسانی ساڵی (١٩٩١)دا ئەوەبوو کە پیاوانی رژێم شوێنی کوردەکانیان دەگرتەوەو دوای جەنگی کەنداو راپەرینیان بەکارهێنا بۆ ئەوەی بەعەرەبکردنی زیاتر لە کەرکوك ئەنجام بدەن. ماوەیەك دوای ئەوە بۆم روون بووەوە کە دەنگی بلدۆزەرەکان نزیکەی دوودەیە دواتر بەرز دەبێتەوە، گەورەکراوەو گۆردراوە بۆ چەکێکی سیاسی. هیچ گومانی تێدانییە کە سیاسەتی درێژخایەنی بەعەرەبکردن دووبارە گەراوەتەوەو لە عێراق سەریهەڵداوەتەوە، هەروەك لەدوای (٢٠٠٣) کوردەکان بەزۆر دەگەرێنرێنەوە، بەدوای ئەوەدا دەگەرێن نەك تەنها بۆ بەدەستهێنانەوەی شتە لەدەستچووەکانیان و دروستکردنەوەی خانووەکانیان بەڵکو بۆ لکاندنی کەرکوك بە هەرێمە ئۆتۆنۆمییەکەیان، ئاواتێکە کە عەرەب و تورکمانەکان بە توندی لە دژی دەوەستنەوە.

لەگەڵ مانەوەی ناکۆکییەکانی پارێزگاکە بە چارەسەرنەکراوی، کێشەی کەرکوك بووەتە گەورەترین کێشەی ناوەندی لە سیاسیەتی ئەمرۆی عێراقیدا. من گەرامەوە بۆ کەرکوك لە حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٣)دا، ئەمجارە بۆ گرووپی قەیرانە نێودەوڵەتییەکان، بینیم کە شارەکە زۆر نارێکە کوردەکان وەك گەردەلوول چووبوونە ناوەراستی شارەکەو لە پێش هێزەکانی ئەمریکاوە بوون، گەمارۆیان خستووەتە سەر دامەزراوە حکومییەکان، هەروەها هەریەك لە پیاوانی سەدام و ئەو عەرەبانەی کە جێگای کوردەکانیان گرتبووەوە دەردەنێن (زۆرێکیان شوێنەکانیان بەجێهێشتووە لە ترسی گەمارۆخستەسەریان، یان لە ترسی تۆڵەکردنەوە لێیان). وادیاربوو کە هێشتا کوردەکانیان چانسێکی تریان هەیە بۆ بەرێوەبەردنی کەرکوك، هەروەها ئەگەر هەموو رۆیشتن وەك پلانیان بۆ دارێژاوە، بیخەنەسەر هەرێمی کوردستان، بەمشێوەیە کوردەکان دەستدەکەن بە خەباتی درێژخایەن بۆ بەدەستهێنانی کۆنترۆڵ لەسەر ئاستی لۆکاڵی، بەڵام ئەوان رووبەرووی توندوتیژی کێبرکێکارەکانیان بوونەتەوە لە دژیان.

عەرەبەکان هەمیشە هیواکانیان لەسەر درۆی دەسەڵاتدارەکانیان بەستووە بۆ هێشتنەوەی کەرکوك لەژێر

دەسەڵاتی بەغدا، لەکاتێکدا تورکمانەکان دەسەڵاتداران لە هەردوولا دەترسێنن. چونکە حاڵەتێکی تایبەتیان هەیە (هیچ نەبێت لەو شارە) کە ئەگەر کەرکوك بکرێتە هەرێمێکی سەربەخۆ ئەوا چانسێکی زیاتریان دەبێت بۆ کۆنترۆڵکردنی سەرچاوەو هێزەکانی ئەو شارە. لەگەڵ ئەوە تورکمانەکان رۆڵێکی سەرەکیان هەیە وەك گرووپێکی کەمینەی گەورە. هەروەك هەموو عێراق، سیاسەتەکان ئاڵۆزبوون، هەروەها هەموولایەك کێبەرکێ دەکەنە بۆ سەرخستنی نەتەوەکانیان وەك هەوڵێك بۆ کارکردن لە دەوری ئەجێندای ئەمریکی و سیستمی سیاسی ناتەواوی بەغدا سەرکردە ئەمریکییەکانیش پەیوەندییەکانیان لەگەڵ هەموو لایەك پاراستووە.

سەرەرای ئەو سۆزەی کە بەرامبەر هاوپەیمانە کوردەکانیان هەیەو تا ئێستاش بەردەوامە، ئەفسەرە ئەمریکییەکان دانیان بەوەناوە کە پێویستە دەسەڵات لە ناوچە فرەنەتەوەو دەوڵەمەندەکان بەسەرچاوەی سروشتی دابەشبکرێت لەنێوان گرووپە جیاوازەکانەوە. ئەوان حیساباتی خۆیان کردبوو لەسەر دابەشبوونی دیمۆگرافی گرووپ و پارتە سیاسییەکان لە کەرکوك، بۆیە کاتێك لە ئایاری ساڵی (٢٠٠٣) ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوکیان دامەزراند، شەش کورسییان دا بە هەریەك لە کوردو تورکمان و عەرەبەکان و کریستیانەکان، لەگەڵ شەش کورسیش بۆ (سەربەخۆکان) وەك پاڵپشتییەکیش بۆ ئارەزووی کوردەکان پێنج لەو شەش کەسە سەربەخۆیە کوردبوون، بەم شێوەیە زۆربەی بەوان بەخشی و توانیان بەهۆیەوە پارێزگار دەستنیشان بکەن. وادیار بوو هەمووشتێك بەباشی دەرۆیشت، هەرنەبێت لەسەرەتادا، بۆ کەیسی کوردی. ئەمە بووە هۆی نارەزایی عەرەبەکان بەوەی ئەمریکییەکان پاڵپشتی کوردەکان دەکەن زیاتر لەوان، ئەمە لە کاتێکدا دووفاقی بەسەرکردە کوردەکانەوە دیاربوو، ئاماژەیان بەوەدەکەنەوە کە رازیبوونی ئەوان لە چوارچێوەی چارەسەرێکی مامناوەندبووە لەگەڵ هەموو لایەنەکان، چونکە ئەوان زۆرینەی دیمۆگرافی پێکدێنن (کە هیچ لایەك ناتوانێت ئەوە پشت راستبکاتەوە یان رەتیبکاتەوە) لەگەڵ مافە مێژووییەکانیان، بەڵام لایەنەکانی تر رەتیانکردەوە.

هەشت مانگ دواتر پۆڵ بریمەری حاکمی مەدەنی هاوپەیمانان، لەدوای ئەوەی دەستیکرد بە نوێکردنەوەی حکومەتە لۆکاڵییەکان (لەنێوان چەندان هیوا) بە شێوەیەك کە کەمتر پشت بە سوپای ئەمریکی ببەستن. هەروەها ببێتە نوێنەرایەتی کردنێکی باشتری عێراقییەکان لەسەر بنەمای دابەشبوونی دانیشتووانی کەبەمەش لەهەر شارێك ئەنجومەنێکی پارێزگاکانی دامەزراندا کە لە ٤٠ کورسی پێکهاتبوون و شوێنی ئەنجومەنی شارەوانییەکانی شارەکانیان گرتەوە.

لە کەرکوك ٣٠ کورسی دا بە کوردەکان، ١٢ کورسیش بە عەرەبەکان، هەروەها هەشت کورسی بە تورکمانەکان و حەوتیش بە کریستیانەکان. لەبەر ئەوەی کریستیانەکان زیاتر لە کوردەکان نزیکن، لەوەش گرنگتر لە چارەنووسی خۆیان دەترسن، لەبەرئەوە لە کوردەکان نزیکتربوون لە کێشە سەرەکییەکان هاوشانی کوردەکان دەنگیان دەدا. بەمشێوەیە، باڵانسی بیست بە بیست مایەوە، ئەم ئەنجومەنە ناتوانێت هیچ بریارێکی چارەنووسساز بدات، ئەمەش بووە هۆی ئارامبوونەوەیەکی کاتی هێشتا کوردەکان هەوڵ دەدەن دەسەڵاتەکانیان پێشبخەن لە ناوچەکانی تر. ئەوان سوودیان لە پارێزگاریکردن و ئامۆژگارییەکانی ئەمریکا وەرگرت بۆ بەرەوپێشبردنی دەسەڵاتەکانیان بەسەر دامەزراوە ئیدارەی و ئەمنییەکان، دوای ئەوەی دەستیان بەسەر بەرپرسیاریەتییە گەورەکانی ئەو شارەگرت دوای هاتنەوەیان بۆ کەرکوك لە ساڵی (٢٠٠٣).

لە هەمووی گرنگتر، حکومەتی هەرێمی کوردستانیش دەستیکرد بە ئاسانکاریکردن بۆ ئەوەی ئەو کوردانەی راگوێزرابوون لەسەردەمی بەعەرەبکردن بۆ گەرانەوە بۆ شوێنەکانیان. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کەرکوکییەکانیان هانبدرێن بۆ ئەوەی لە هەرێمی کوردستانەوە بگەرێنەوە بۆ کەرکوك.

حکومەت پارەی دەبەخشییە کوردەکان وەك هاندانێك بۆ ئەوەی بتوانن زەوی بکرن و سەرلەنوێ خانوو دروستبکەنەوە لەو شارە، لەهەمانکاتدا رێگری لێدەکردن لە کرینی موڵك لەناو هەرێمی کوردستان. خزمەتگوزارەییە مەدەنییەکانیشی گواستەوە بۆ کاری نوێ لەو ناوچەیەو ئەوانیش ناچاربوون کە منداڵە تازە لە دایکبووەکانیان لەوێ تۆماربکەن.

بەهۆی نەبوونی لایەنێکی بێلایەن بۆ سەرپەرشتیکرنی ئەو گەراوانە، ئەمە بووە هۆی دروستبوونی گومان لەلای عەرەب و تورکمانەکان بەوەی ئەو کوردە گەراوانە تەنها لەسەر کاغەز خەڵکی رەسەنی ئەو ناوچەیەن. ئەوان گومانی ئەوەیان هەبوو کە ئەو کوردە گەراوانە خەڵکی هەولێرو سلێمانی بن، بەڵکو تەنانەت خەڵکی ئێران و سوریا و تورکیاش. ئەوەی کە روویدا، ئەوان وتیان ئەوە بە کوردی کردنە، هەروەك هەمان پاکتاوی رەگەزی پێشووە، ئەگەر توندیەکەشی لە بەعەرەبکردنی پێشوو کەمتربێت.

لە هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥) ی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك، کوردەکان دووبارە زۆرینەیان بەدەستهێنا، بەمەش توانیان زیاتر پاڵپشتی دەسەڵاتە لۆکاڵییەکەیان بکەن کە لەمەدا بەشێك لە هۆکارە بۆ کەمی بەشداری عەرەب و تورکمانەکان دەگەرێتەوە. لیستی برایەتی کەرکوکی کوردی کە لیستێکی کوردی بوو، بەڵام چەند کەسێکی عەرەب و تورکمان و کریستیانی نزیك لە کوردەکانی تێدابوو توانی بیست و شەش کورسی ئەنجومەنی پارێزگا بەرێتەوە، پارتە عەرەبییەکانیش نۆ کورسی و پارتە تورکمانەکانیش شەش کورسیان بەدەست هێنا.

لیستی برایەتی کەرکوك ئەو سەرکەوتنە گەورەی لە هەڵبژاردنەکان بەدەستی هێنا بەکاریهێنا بۆ دەستنیشانکردنی هەریەك لە پارێزگارو سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگا، جێگرەکانی پارێزگاریشی بۆ عەرەب و تورکمانەکان بەجێهێڵا. بەداخەوە کە نوێنەرانی هەریەك لەو گرووپانە نەیان توانی لەسەر کاندیدایەك رێك بکەون، بۆیە ئەو

پۆستانە بە بەتاڵی مانەوە. ماوەیەکی زۆری نەبرد، عەرەب و تورکمانەکان سکاڵای ئەوەیان دەکرد کە زمانی کوردی لە شوێنە فەرمییەکان بەکاردەهێنرێت، بەم شێوەیە تا کۆتایی ساڵی (٢٠٠٨) بایکۆتکردنی ئەو لایەنانە بەردەوام بوو.

لە کەرکوك وادیاربوو کە کوردەکان کۆنترۆڵیان بەدەستەوەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو کارەی بۆ رێکخستنی ئاستی ناوخۆیی کرا، شانۆگەرییەکی تەواو جیاواز لە مێژوو چاوەروان کراوبوو وەرێکەوت. سەرکردە کوردەکان هەرگیز ئەوەیان نەشاردبووەوە کە ئامانجیانە کەرکوك بخەنە سەر هەرێمی کوردستان. بۆ پاڵپشتیکردنی دەسەڵاتەکانیان لە کەرکوك، کوردەکانیان پێویستیان بە دەسکاریکردنی دەستووری عێراقی هەبوو بۆ دانان بە مافە تایبەتییەکانیان لە کەرکوك.

سەرکەوتنیان لە ئەنجامدانی ئەو دەستکارییانە هەرچۆنێك بێت تێکەڵ ببوو. سەرکردە کوردەکان نیمچە سەرکەوتنێکیان بەدەستهێنابوو لە یاسای بەرێوەبردنی دەوڵەت (tal) کە لە ساڵی (٢٠٠٤) نووسرابوو، ئەو یاسایە کاری پێکرا تا عێراقییەکان سەروەری خۆیان وەرگرتەوەو دەستووری وڵات نووسرایەوە.

ماددەی (١٤٠) لە یاسای (tal) دروستبوو بۆ نەهێشتنی ئاسەواری بەعەرەبکردن و دانەوەی زەویوزاری دەرکراوان و تەعویزکردنەوەیان بەپارە، نەهێشتنی بەربەست لە بەردەم کشتوکاڵی کوردەکان و رۆیشتنەوەی ئارەزوومەندانەی ئەوانەی هێنرابوونە ئەو شارەو گەرانەوەی ئەوانەی کە راگوێزرابوون (هەموو لایەك بەبێ جیاوازی)، هەروەها گێرانەوەی سنووری ئیداری کەرکوك بۆ سەردەمی پێش (١٩٦٨)، کە ئەمەش لە کۆتاییدا گێرانەوەی کەرکوکی بۆ سەر هەرێمی کوردستان ئاسانتردەکات. هەموو ئەو هەنگاوانە، ئەگەر بەتەواوی جێبەجێبکرایە، ئەوا بێگومان زۆرینەیەکی کوردی لە شاری کەرکوك بەرهەم دێنێت. لە جێبەجێکردنیشدا یاسای (tal) ئاماژەی بە ئەنجامادانی ریفراندۆم لە کەرکوك نەدا، ئەم ئەرکەی بۆ ئەوانە جێهێشت کە رەشنووسی دەستووری دەنووسنەوە. بەکورتی، گرنگ نییە ژمارەی ئەو کەرکوکیانەی گەراونەتەوە شوێنەکانیان لە کەرکوك، بەبێ دەرچوونی یاسایەك بۆ دیارکردنی حاڵەتی یاسایی ئەو هەرێمە، هەر بەناکۆکی لەسەر دەمێنێتەوەو بە پێی واقیعیش تا ئێستا ئەو ناوچەیە راستەوخۆ لەژێر کۆنترۆڵی بەغدایە.

لە شکستێکی نوێشدا بۆ کوردەکان، یاسای (tal) ماددەی (٥٣)ی لەخۆدەگرت، کە حاڵەتی تایبەتی دەدایە هەریەك لە بەغداو کەرکوك و رێگری لەوە دەکرد کە هەریەك لەو دوو شارە بخرێتە ناو هیچ هەرێمێکی سەربەخۆوە. بەم شێوەیە، کاتێك عێراقییەکان دەستیان کرد بە نووسینەوەی رەشنووسی دەستوورەکەیان لە ساڵی (٢٠٠٥)، کوردەکان پاڵپشتێکی یاساییان هەبوو بۆ نەهێشتنی ئاسەواری بەعەرەبکردن، بەڵام هێشتا ژینگەیەکی تایبەتی بە بەهای وا دروست نەبووە بۆ گێرانەوەی کەرکوك.

دەتوانین بڵێین دەستووری ساڵی (٢٠٠٥) حاڵەتی پێشووی پێچەوانە کردەوەو دەسەڵاتی یاسایی تەواوی بە کوردەکان بەخشی بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی ئەو شارە دەوڵەمەندە بەنەوت بکەن. کە لەلایەن (٨٠٪)ی دەنگدەرانەوە لەسەرانسەری وڵات لە تشرینی یەکەمی (٢٠٠٥) پەسەند کرا، ئەو دەستوورە گەورەترین بردنەوەی سیاسی بووە بۆ کوردەکان. ماددەی ١٤٣ لە یاسای (tal) حاڵەتی تایبەتی بەخشییە کەرکوك بەوەی کە ناتوانێت هەرێمێکی سەربەخۆ لە حکومەتی ناوەندی دابمەزرێنێت. هەروەها ماددەی ١٤٠ حاڵەتی ئەوەی بەخشییە کەرکوك کە لە پرۆسەیەکەدا پرسە هەڵپەسێردراوەکانی چارەسەربکرێت لەگەڵ ناوچە ناکۆك لەسەرەکانی تریش لەرێگای سەرژمێری گشتی و ریفراندۆمی میللی (کە سەرکەوتو نەبوون لە ئەنجامدانی لە کاتی خۆی).

(٣١)ی کانونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٧). سەرکردە کوردەکان کە رەشنووسی ئەو ماددەیەو چەندین ماددەی تریان نووسیبوو بە هاوکاری چەندین راوێژکاری رۆژئاوایی وەك پیتەر گالبرێس (لەو کاتە رووبەرووی چەندین رەخنە بوونەوە بەوەی لە پرۆسەیەکی وادا تێوەگلاوە) کە سەرژمێری ئەوەیان کرد کە ئەگەر ریفراندۆم لەسەر بنەمای زۆرینەی کورد بکرێت لە رێگای ئاساییکردنەوەی بەعەرەبکردن ئەوا هیچ گومانی تێدا نییە کە کەرکوك دەبێتە بەشێك لە هەرێمی کوردستان.

هەر بۆیە لە رێگای ئەو هەموو سەرەوژێربوونە، خەریکە دەردەکەوێت کە کوردەکان لە رێگای یاساییەوە کۆنترۆڵی تەواویان بەسەر کەرکوك کردووە، بەڵام هەروەك زۆرێك لە سیاسەتەکانی تری عێراق، هیچ شتێك زۆر سانا نییە. لەگەڵ ئەوەی دەستوور لە بەرژەوەندی ئەوان نووسراوە، بەڵام کوردەکان بۆیان دەرکەوتووە کە حکومەتی ناوەندی نایەوێت جێبەجێی بکات. دوای دوو ساڵ لە بەرواری کۆتایی ریفراندۆم لەسەر ماددەی ١٤٠، بەڵام بەغدا هێشتا خاوە لە ئەنجامدانی سەرژمێری گشتی و ئەنجامدانی ریفراندۆم لە کەرکوك، بەغدا بەو خاویەی دەیەوێت بیرۆکەی ئەوە گەشەپێبدات کە کەرکوك شارێکی بێ وێنەیەو پێویستە هەڵسوکەوتی تایبەتی لەگەڵ بکرێت، ئەمەش وای لێدەکات نەبێتە بەشێك لە هەرێمی کوردستان. گرفتەکانی کورد ئەوەندەی تر قووڵ بوونەوە بە هەڵبژاردنی دەستووری یەکەم، سەرۆك وەزیران نوری ئەلمالکی کە گومان و پرسیاری خستەسەر یاسایی بوونی دەستوور. بەو شێوەیەی کە دۆکیومێنتەکە رەشنووسی یەکەمی لە پشت دەرگا داخراوەکانەوە نووسرابوو، نەبوونی کاریگەری دەخلێکی بەرفراوان و ئائامادەیی هەڵبژاردنی نوێنەرایەتی سوننە عەرەبەکان، لەلایەن پەرلەمانەوە بریاری لە سەردراو لە دواتریشدا لەلایەن دەنگدەرانەوە بەشێوەی زۆرینە بە سلبی دەنگی لەسەر درا (پیاوە ئاینییەکانی شیعە پشتیوانانیان هاندا لەسەر دەنگدان و پشتگیری لەسەر دۆکیومێنتەکەی)، ئەمەو کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبوو لەسەر میسداقیەکەی. مشتومرو جیاوازییەکان زۆربوون لەسەر ژمارەی کۆبۆنەکان خۆراکی ئەو ناوچەیە. جگە لە کوردەکان هەمووان تووڕەو نیگەران بوون بە ماددەی (١٤٠) ئەمەش مانای ئەوەیە زۆر

ئەستەمە جێبەجێ بکرێت.

لەگەڵ ئەوەدا، کوردەکان بەردەوام بوون لەوەی سووربن لەسەر ئەوەی کە داخوازییان لەسەر کەرکوك بنەمایەکی مێژوویی و ویژدانی هەیە، وسیمبولی تینوێتی عەدالەت دەکات لەدوای ئەو چەرمەسەری و ناخۆشیانەی لەلایەن رژێمەکانی پێشووی عێراقەوە بەسەریدا هاتووە، بەتایبەت لە سەردەمی (سەدام حوسێن)دا. شتێك کە ناکرێت لەبیری بکەین ئەوەیە پرسی کەرکوك ناتوانرێت جیابکرێتەوە لە خواستی فراوانی کوردەکان بۆ سەربەخۆیی، تەنانەت سووربوونی بەردەوامی کوردەکان لەسەر ناوچە جێناکۆکی لەسەرەکان هەر لەبەرئەوەیە کە لە دوایشدا کەرکوکیش بەدەست بهێنن.

هەروەکو رژێمی (سەدام حوسێن) کە بەعەرەب کردنی (تعریب) وەکو ئامرازێك بەکارهێنا بۆ پاراستنی زاڵبوونی خۆی بەسەر پارێزگاکەداو پاراستنی هێزی ئابووری و یەکپارچەیی خاکی عێراق، هەربۆیەشە کوردەکان کەرکوك وەکو سامان و بنەمایەکی ئابووری دەبینن بەمەبەستی سەربەخۆیی بوون (کە لە ئێستادا بەشێکی بەندە بەکوردستانەوە، بەڵام لە حاڵەتی ئامادەبووندایە) لە ئایندەدا. سەرکردە کوردەکان بەتەواوی دەرك بەوەدەکەن کە هیچ یەك لە هاوسێ بەهێزەکانیان، ئێران، تورکیا یاخود سوریا قبووڵی کوردستانێکی سەربەخۆ ناکەن، هاووڵاتییە کوردەکانی خۆیانیان پێبدەن، تەنانەت ئەگەر کوردەکان بەشێوەیەك لە شێوەکان قەوارەیەك بەدەست بهێنن، ئەوا تەنها کیانێکی دابراویان بەش دەبێت. لەگەڵ ئەوەدا بەبوونی (کەرکوك)، قەوارەکەیان بە شێوەیەکی روون نفوزێکی زیاتری دەبێت لە مامەڵەکانی دەرەوەیدا، ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئومێدی بەیەکگەیشتنێکی رەزامەند هەڵدەگرێت، کە گۆرانکارییە داینامیکییە هەرێمییەکانە.

لە حوزەیرانی (٢٠٠٧)دا، یەکێك لەسەرکردە کوردییەکان پرسیاری ئەوەی لێکردم ئایا (بۆش) لە مانگەکانی کۆتاییدا هێرش دەکاتە سەر ئێران؟ لە کاتێکدا کە من وەڵام (نەخێر) بوو، ئەو زۆر خەمبارانە وەڵامی دایەوە. بەبۆچوونی ئەو، جەنگی (ویلایەتە یەکگرتووەکان) لەگەڵ (ئێران) هاوکێشە سیاسییەکان دەگۆرێت لە ناوچەکەدا لە سنوورەکاندا رووبدات، چانسی سەرکەوتنی کوردەکان زیاتربکات، هەروەکو تێکشکانی (ئیمپراتۆریەتی عوسمانی) ئەوەی کرد. ئەمە ئەو رووداوی گۆرانەیە لە سنوورەکاندا کە کوردەکان چاوەروانی دەکەن، ئامادەسازی بۆ دەکەن.

وەکو سەردانکەرێکی بەردەوام بۆ کەرکوك لە ساڵی (٢٠٠٣)ەوە پەیوەندیم دروستکردووە لەگەڵ سەرکردە سیاسییەکانی هەرچوار پێکهاتەکە کە خۆیان بە نوێنەری ئەو چوار نەتەوەیە دەبینن کە لە پارێزگاکەدا دەژین، لەگەڵ ئەوەدا پەیوەندیم دروستکردووە لەگەڵ رۆژنامەنووسان، هەروەها رۆشنبیران و ئەندامەکانی دیکەی کۆمەڵگەی مەدەنی. هەموو گێرانەوە جیاوازە مێژوویی و سایکۆلۆژییەکانم گوێ لێبوو کە وادەکات ئەم ناوچەیە لە ناوجەرگەی کێشەکاندا بمێنێتەوەو هەرگیز پشوو نەدا.

ئەگەر کوردەکان ژمارە دیمۆگرافییەکان بە بەڵگە بهێننەوە بۆ پشتگیریکردن لە کەیسەکەیان، ئەوا عەرەب و تورکمانەکانیش وادەکەن، لە حاڵەتی نەبوونی سەرژمێری دانیشتووواندا، هیچ یەك لەوانە ناکرێت پشتی پێببەسترێت. بەهەمان شێوە، ئەگەر کوردەکان بەڵگەی مێژووی بهێننەوە، ئەوا تورکمانەکان دەگەرێنەوە بۆ پێشووترو سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانییەکان کە ئەوانی گەیاندە ئەو ناوچەیە، ئەمە لە کاتێکدا کریستیانەکان بە قوڵایی مێژوودا دەچن و خۆیان بە نەوەکانی (ئاشووری)یە کۆنەکان دەبینن، کە دەسەڵاتی کەرکوکیان لەژێر دەستدابووە، ناوی (ئارەفا)بووە، ناوەندێکی بچووکی بازرگانی بووە، لەلای هەردووکیان، کوردەکان لە کۆتاییەکاندا هاتوونەتە ئەو ناوچەیەوە. سەرەرای ئەوە، لە کاتێکدا کوردەکان کێشەی پرۆسەی بەعەرەبکردن باس دەکەن، عەرەبەکان دەڵێن لە کاتێکدا (رژێمی بەعس) کوردەکانی لەو ناوچەیەدا دەسریەوە، زۆربەی عەرەبەکان هاتن بۆ کەرکوك تەنها لەبەر ئەوەی ئەوان کاریگەربوون بە گەشەسەندنی (پیشەسازی نەوت)، ئەمەش بابەتێکی ئابوورییەو بەبێ بوونی پاڵپشتی و هاندانی دەوڵەتیش روودەدات (ئەمەش وەکو هەمان دیاردەی هاتنی کوردەکان لە پێشوودا بۆ کەرکوك)، بەڵام کوردەکان دەڵێن بابەتەکە پەیوەست نییە بە (نەوت)ەوە ئەوانی تر دەڵێن بەدڵنیاییەوە بابەتەکە تەنها نەوت هۆکارە بووەو کوردەکان فێڵ و تەڵەکە دەکەن. هەموو لایەنەکان دۆکیومێنتی خۆیان پیشان دەدەن بۆ پشتگیریکردنی گێرانەوەکانیان، بەڵگەکانی بەرامبەریان بە ساختەو فێڵ ناوزەد دەکەن"[1].

"لەناو خودی کەرکوکدا، هەموو شتێك لە چاوەروانیدایە. لە فەرمانرەوایدا، چەقبەستوونی بوونی هەیە. بواری ئابووری تووشی دەستەوەستان بوو، لەگەڵ بەرهەم هێنانی رێژەیەکی زۆری نەوتدا، بەڵام بواری نەوت بەرادەیەکی زۆر کەمی کردووە لەچاو ساڵی (٢٠٠٣)دا، هەروەها کۆمپانیاکانی نەوتی رۆژئاوا تا چەندە ئەتوانن نەوت بەرهەم دەهێنن لە بارودۆخی خاکێدا کە تیایدا زێری رەش تاکو ئێستا چارەنووسی یەکلایی نەکراوەتەوە. لەگەڵ ئەوەدا کە بواری ئاسایش لەژێر دەسەڵاتی کوردەکاندا بەرادەیەك بەسەقامگیری ماوەتەوە، سکاڵاو شکایەتەکان بەردەوام زیاد دەکەن، بەتایبەت لەناو عەرەبەکاندا، کە لە دواجاردا بەشێوەیەکی یاخیانە دەردەکەون و لەلایەن هێزی هاوبەشی بنەبرکردنی تیرۆری ولایەتە یەکگرتووەکان و کوردییەوە کۆتاییان پێدەهێنرێت.

سەرکردەکانی ناوخۆ، هیچ چارەسەرێك بۆ ناسۆرییەکەیان نابینن و روو لە هێزو پارتەکانی دەرەوە دەکەن بۆ ئەوەی دڵنەواییان بکەن، ترسی ئەوەشیان هەیە پشتیوانانی بەرامبەرەکانی سەربکەون بۆیە بەدەنگێکی بەرزەوە رەخنەدەگرن لە دەستێوەردانی دەستی دەرەکی لە کاروباری کەرکوك.

هەریەك لە گرووپە گەورەکان پشتیوان و هاندەرێکی خۆیان هەیە، بەڵام هیچ یەك لەو پەیوەندییانە هۆکاری ئارامی نین. سیاسەتوانە عەرەبەکانی کەرکوك، کە سوننین، روو لە بەغدا دەکەن بۆ پشتگیری، بەڵام حکومەتێکی شیعەی

ئیسلامیی دەبینن کە حکومەت بەڕێوە دەبات ئیتر ئەمە هۆکارێکە بۆ ئەوەی متمانەیان نەبێت، هەرچەندە گەر مالکی هاوڕێ بەشی ئەوان بێت لە کەرکوك لەلایەن خۆیانەوە، کوردەکان پشت دەبەستن بە ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ بەدەستهێنانی کەرکوك، بەڵام خیانەتەکانی ساڵی (١٩٧٥) (لە کاتێکدا ئیدارەی (فۆرد) پشتیوانی خۆی کێشایەوە لە (مەلا مستەفا)و ساڵی (١٩٩١) لە بەرچاو دەگرن (لە کاتێکدا (جۆرج بۆش)ی باوك ڕێگەیدا بە (سەدام حوسێن) دا بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی هێزە یاخییەکانی دوای جەنگی کەنداو ببێتەوە بە فڕۆکەی هەلیکۆپتەر) ئەمەش وایکردووە هەست بە بەدگومانییەك بکەن بەرامبەر بە ئامانجەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ناوچەکەدا کە وایدەبینن لە کۆتایدا خۆی دەبینێتەوە لە پەیوەندییەکانی (واشنتۆن) لەگەڵ وڵاتەکانی وەکو (عێراق و تورکیا)، نەئەوەی لەگەڵ قەوارەیەکەدا کە دەوڵەت نییە وەکو خۆیان. بەهەمان شێوەش بۆ تورکمانەکان.

ئیسلامییە شیعەکان هەوڵدەدەن ڕوو لە (بەغدا) بکەن، لە کاتێکدا کە زۆربەی (سوننە)و (تورکمانە عەلمانییەکان) خەون بە سینارێیەکەوە دەبینن کە تورکیا تەداخول دەکات، بەڵام ئەمە وەکو دواهەمین داڵدە. دەکرێت بەهێزبوونی دەسەڵاتی (مالیکی) لە سەرۆك وەزیرێکی لاوازەوە لە ساڵی (٢٠٠٦)دا بۆ سەرکردەیەکی زۆر بەهێزو ئەو پێگەیەی ئێستای دەکرێت هۆکارێکی ئەوەبێت کە کێشەی کەرکوکی بەکارهێناوە بۆ زیاتر دەرکەوتنی متمانەو بەڵگانامەی بەهێزی لەناو زۆربەی عەرەبەکانی عێراقدا.

لە (ئاب)ی (٢٠٠٨)دا هێزی ڕەوانەکرد بۆ دەرکردنی هێزەکانی ئاسایشی کوردی (پێشمەرگە) لەو شارانەی کە دانیشتووانەکانیان جیاوازو تێکەڵن وەکو لە (دیالە)، پارێزگایەکە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی (بەغدا)ەوە کە لەسەر سنووری کوردستانە. لە دواتریشدا کاری کرد لەسەر زیاتر دەرکەوتنی وجودی هێزەکانی (عێراق) لە (کەرکوك)، بەتایبەت لە نزیك ناوچەکانی بەرهەمهێنانی نەوت.

لە ماوەیەکی کەمدا، یەکەکانی سوپا دەرچوون بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لە زۆربەی ناوچە کوردییەکان بۆ هەڵکردنی ئاڵای عێراقی، ئەمە بۆیە هۆی ئەوەی کوردەکان نارەحەت و تووڕەبکات، بەڵام زۆربەی عێراقییەکانی تر بەمە دڵخۆشبوون. سەرەڕای ئەمانە، پرۆسەی چارەسەرکردنی بارودۆخی کەرکوك لە ڕێگەی ریفراندۆم و سەرژمێرییەوە وەستاوەو مەسەلەی کەرکوك گەیشتووەتە ئاستێکی تر کە هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە سەقامگیرکردنی ئاسایشە لە سەرتاسەری عێراقدا. کاتێك دیمەنێکی لاوەکی هەوڵەکان بۆ بنیاتنانەوەی وڵاتە، ئەوا لە ئێستادا بووەتە هۆی ئەوەی سیاسەتیش بشێوێنێت.

کەرکوك گۆڕاوە بۆ ئامانج و شوێنێکی گەرمی سیاسی و تێکدەری هەڵبژاردنەکان. لە (تەموز)ی (٢٠٠٨)دا، یاسادانەران ڕەشنووسی یاسای هەڵبژاردنی پارێزگاکانیان تێپەڕاند، کە بڕیاربوو کەمتر لە سێ مانگ دواتر ڕووبدات. کە بەندێکی تێدایە دەربارەی کەرکوك، کە ئەمەش بۆیە هۆی تووڕبوونی پەرلەمانتارە کوردەکان و بایکۆتی دەنگدانیان کرد. ئەو یاسایە ڕووبەڕووی (ڤیتۆ) بووەوە لەلایەن ئەنجومەنی سەرۆکایەتییەوە، کە (جەلال تالەبانی) سەرۆکایەتی دەکات. ماوەی (٢) مانگی خایاند تا ئەوەی گەیشتنە ڕێککەوتنێك کە هەموو لایەنەکان لە سەری ڕەزامەند بن. بڕیاری نوێ ئەوەبوو کە هەڵبژاردن لە (کەرکوك) دوابخرێت تا دوای ئەوەی لیژنەیەکی پەرلەمانی لێکۆڵینەوە دەکات و ڕاسپاردە پێشکەش دەکات دەربارەی هاوبەشی دەسەڵات، تۆماری دەنگدەران و کێشەی موڵکدارێتی لە کەرکوك. لە کاتێکدا کە لیژنەکە بێتوانایی خۆی سەلماندووە بۆ تەواوکردنی کارەکانی، کەرکوکییەکان تاکو ئێستا چاوەڕوانی ئەو هەڵبژاردنەن.

ڕۆڵی کەرکوك لە تێکدانی هەڵبژاردنەکاندا تەنها کاریگەری نییە بۆ سەر سیاسەتی ناوخۆی ناکۆکی لەسەر بارودۆخی کەرکوك بەهەمان شێوە ڕێگرە لە توانای عێراق بۆ ئەوەی وەکو دەوڵەتێکی دیموکراتی کاربکات. لە (تشرینی یەکەم)ی (٢٠٠٩)دا، پێویست بوو لەسەر پەرلەمانتارەکان بەوەی کە دەنگ بۆ یاسایەك بدەن بۆ ئەوەی سیستەمێك دابرێژێت بۆ پەرلەمانی کە بڕیاربوو لە (کانوونی دووەم)ی (٢٠١٠)دا ئەنجام بدرێت، بەڵام پەرلەمان نەیتوانی لەسەر یاساکە ڕێکبکەوێت، ئەمەش فشاری خستەسەر عێراق بۆ ئەوەی پەنابباتەبەر یاسای (کانوونی یەکەم)ی (٢٠٠٥) کە هەڵبژاردنەکانی پێشووی پێبەڕێوەبراوە بە ئەنجامدانی چەند گۆڕانکارییەك لەو شوێنانەی کە زۆر پێویست دەکات. ئەوەبوو، بەهەمان شێوە، چەندین بابەت هەست پێدەکرا کە تەحەددا بوون لەو نێوەندەدا. کەرکوکیش یەکێك بوو لە گەورەترین کێشەکان. یاسادانەران و پەرلەمانتارەکان مشتومڕێکی زۆریان کرد لەسەر لیستی دەنگدەرانی پارێزگاکە ئایا دەکرێت ئەوە نوێ بکرێتەوە لەلایەن کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکاني عێراق هەروەکو ئەوەی لەم دواییانەو لە (ئەیلول)ی ساڵی (٢٠٠٩)دا ئەنجامدرا، کە بەشی ئەو کوردانەشی تێدا حساب کراوە کە هاتوونەتە کەرکوکەوەو رایدەگەیەنن کە پێش ساڵی (٢٠٠٣) دەرکراون لەو شارە؟ یان ئەوەی لە ساڵی (٢٠٠٤)دا ڕێکخرا، پێش ئەوەی کوردەکان بە ڕێژەیەکی زۆر بچینەوە بۆ ئەو شارە؟ سەرکردە کوردەکان زیاترخوازیاری خیاری پێشووترن، سیاسەتوانە عەرەب و تورکمانەکانی کەرکوك، خواستی خیاری دووەمیان هەیە. هەردوو لایەنەکە ترسی ئەوەیان هەیە بڕیارەکە بەشێوەیەك بێت ئەوانەی مافی دەنگدانیان هەیە لە کەرکوك سەرەتایەکی ترسناك بنیات بنێت کە پێش ئەنجامێك بێنێتە کایەوە کە کاریگەری هەبێت لەسەر هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی پارێزگا و ئەنجامدانی ریفراندۆم لەسەر بارودۆخی پارێزگاکە. ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە تێڕوانینێکی چەسپاو لە عێراقدا بوونی هەیە کە کوردەکان بۆ کاندیدە کوردەکان، عەرەبەکان بۆ عەرەبەکان، وتورکمانەکان بۆ تورکمانەکان دەنگ دەدەن، ئەمەش دەکرێت بۆ کەرکوك ڕاست بێت. لە کۆتاییدا، تۆماری دەنگدەرانی ساڵی (٢٠٠٩) بڕیاری لە سەردراوەو یاساکە تێپەڕێنراوە، بەڵام هەندێ درزو هۆکاری دەربازبوون ماونەتەوە. تەحەددییەکانی

ئەنجامەکانی هەڵبژاردن ڕێگەیدا بە گەشەکردنی ساڵانەی دانیشتووان تا دەگاتە (٥٠). ئەمەش شتێکی چاوەڕوان کراوبوو. وەکو ئەوەی لە کەرکوکیشدا ڕوویدا وە.

ئەنجامەکانی هەڵبژاردنیش ناکرێت بەکاربهێنرێت وەکو ڕێنیشاندەرێك بۆ گۆڕانکاری ڕێکخستنی سیاسی و ئیداری، بەمانایەکی تر، ئەنجامەکان کاریگەرییەکیان نابێ لەسەر بارودۆخی کەرکوك. بە هەموو ئەو هەوڵانەی خستیانەگەڕ، پەرلەمانتارانی عێراق تەنها کاروبارەکانی ڕێکخستنی کەرکوکیان نارەحەتتر کرد.تەنانەت سەرکەوتنە یاسایە بێبایەخەکە ماوەیەکی کورتی خایاند.

(تاریق ئەلهاشمی)، یەکێك لە جێگرەکانی سەرۆك کۆماری عێراق، ڕایگەیاند: (کە ئەو لەگەڵ بۆ چوونی ئەندامانی تری ئەنجومەنی سەرۆکایەتیدا نییە بەوەی واژۆ لەسەر یاسای هەڵبژاردنەکان بکات). قەیرانێکی سیاسی ڕوویدا. هەرچەندە ڤیتۆکەی (هاشمی) پەیوەندییەکی کەمی هەبوو بە کەرکوکەوە، مشتومر لەسەر یاسایی بوونی نوێنەرایەتی پارێزگاکانی ئەو پێشوودا لە پەرلەمان ڕەزامەندی لەسەردرا. کێشەی سەرەکی کەرکوکە، کە بووە هۆی دواخستنی هەڵبژاردنە گشتییەکان. تەنانەت کاتێك عێراقییەکان چوون بەرەو دەنگدان، دەرفەتی کێشەی تر بوونی هەیە. ئەمجارە دەکرێت کێشەی کەرکوك گەورەتر ببێت، تەنانەت بگۆڕێت بۆ تێکدەرێکی زۆر کاریگەر. سەرکەوتووەکان دەشێت بەیەکەوە هاوپەیمانییەکی فەرمانڕەوایی پێکبهێنن. بە خوێندنەوەی سروشتی فرەپارچەیی دیمەنی سیاسی عێراقی، لەگەڵ ئەوەدا، کارێکی لەو شێوەیە ئەوەندا ئاسان نییەو چەند مانگێکی دەوێت تا ڕێکدەخرێت. براوەی یەکەم ناتوانێت زیاتر لە یەك لەسەر چواری دەنگەکان بەدەست بهێنێت، بەڵام چاوەڕێ دەکرێت جیاوازییەکی گەورەی هەبێت لەگەڵ هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠٠٥)دا، کە (ئیسلامییە شیعەکان) تەنها (١٠) کورسیان مابوو بۆ ئەوەی بتوانن زۆرینەی ڕەها بەدەست بهێنن. لەپاش ماوەیەکی زۆر لەدوای مشتومرەکانی دوای هەڵبژاردنەکان واچاوەڕوان دەکرێت کوردەکان نەتوانن وەکو هێزێکی سیاسی کاریگەر لە گۆڕەپانی سیاسی عێراقیدا دەربکەون وەکو ئەوەی لە ساڵی (٢٠٠٥)و (٢٠٠٦) دا بوونیان هەبوو.

لیستی سەرەکی کوردەکان لیستی هاوپەیمانی کوردستان، تاکو ئێستا هەوڵێکی زۆر دەدات بۆ ئەوەی لە دەرەوەی ناوچە کوردییەکان دەنگ بەدەست بهێنێت. مەرجی سەرەکی کوتلەکە بۆ بەشداری کردن و پێکهێنانی لە حکومەتی نوێدا، سوێندخواردنی دەستووری هاوشانەکانیانە لە حکومەتدا بەوەی داوای تەنازولاتیان لێ نەکەن لەسەر کەرکوك.

سەرکردە کوردییەکان شەرمیان کردووە لەو داواکارییانەی کە تاکو ئێستا کردوویانە، بەڵام ئەگەر ئەزموونەکانی پێشوو وەستانێك بێ کە لەسەری بڕۆن، ئەوا ئامانج ئەوەیە هەندێ هەنگاوی دامەزراو بنیات بنێن تا کارئاسانی بکات بۆ بەستنەوەی کەرکوك بە هەرێمی کوردستانەوە.ئەمەش دەکرێت دیاریکردنی بەراووردێکی دیاریکراو بێت بۆ ئەنجامدانی ریفراندۆم لە کەرکوك یاخود دیاریکردنی بەراووردێك بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنی پارێزگا لە کەرکوکدا بە بەکارهێنانی نوێکردنەوەی تۆماری دەنگدەران، یان ڕەزامەندیدانی (بەغدا) لەسەر پێدانی کۆمپانیاکانی نەوت، کە حکومەتی هەرێمی کوردستان کۆنتراکتی لەگەڵدا واژۆ کردوون، بە ئەو ناوچەیەشەوە کە دەکەونە سەر خاکە جێناکۆك لەسەرەکان.

لەگەڵ ئەوەدا، جێگەی گومانە سەرکردە سیاسییەکان خواستی ئەوەیان هەبێت یاخود توانای ئەوەیان هەبێت هەر سازشێك بکەن لەسەر کەرکوك لە ناوەندی بوژانەوەی قەومیەتی عێراقی. ئیدارەی ئۆباما بەشێوەیەکی هێمن، ئەگەر بەشێوەیەکی ڕوونیش نەبێت دەستیکردووە بە پشتگیری کردنی بۆ جۆرێك لە بارودۆخی تایبەت بە شاری کەرکوك، لەوانەیە ئەوە هەڵبژاردەیە هەمووان بێئومێد بکات، بەڵام وادەردەکەوێت کە تاکە ڕێگابێت بەمەبەستی سەقامگیرکردنی ئاشتی. کۆشکی سپی دەستی کردووە بە کارکردن لەسەر ئەو هێزانەی کە ڕێگای دەرچوون لە مەتەڵی کەرکوك پێش ڕاگەیاندنی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا، کە بڕیار وایە لە کۆتایی (٢٠١١)دا کۆتایی پێبێت.

گۆڕانی (ئیدارەی بۆش) لە پشتگیری ماددەی (١٤٠) هاوشان لەگەڵ گۆڕانی (یۆنامی)دا هاتەکایەوە کە دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە لە کێشەی کەرکوك پاش ئەوەی کۆتایی هات بە کاتی دیاریکراوی (ریفراندۆمی ٢٠٠٧). ئەو ڕاپۆرتەی خرایەڕوونە کەرکوکی وەکو پارچەیەك لە هەرێمی کوردستان ناساندو نەوەکو پارێزگایەك کە ڕاستەوخۆ لەژێر دەسەڵاتی بەغدادا بێت. بابەتێکی گرنگتر ئەوەیە، (یۆنامی) بیرۆکەی ئەنجامدانی ریفراندۆمی بنیاتنراو لەسەر دەنگدانی نەژادی ڕەتکردەوە، هەروەکو ناوزەدیکرد بە (ریفراندۆمی شەرانگێزانە)و کە هیچ کاریگەرییەکی نابێت تەنها ئەوە نەبێت کە موژدەی جەنگ دەدات. لە شوێنی ئەوە موفاوەزات دەکرێت ببێتە هۆی ئەوەی ڕەزامەندی لەسەر چارەسەرێکی ناوەندگیر بێنێتەکایەوە کە پێویست دەکات لەلایەن دەنگدەرانی کەرکوکەوە ڕەزامەندی لەسەر بدرێت و دەنگی لەسەربدرێت، ئەوەی ناودەبرێت بە (ریفراندۆمی چەسپێنەر). بەگەیشتنە دەرەنجامێکی لەو شێوەیە واچاوەڕوان دەکرێت ببێتە هۆی ئەوەی بارودۆخێکی تایبەت بەو شارەبدات، بەشێوەیەك لە شێوەکان، بۆ نموونە، هەریەك لە حکومەتی عێراقی ناوەندو حکومەتی هەرێمی کوردستان، کاریگەرییەکی گرنگیان هەبێت لە پارێزگاکەداو ڕێکخستنێك بکەن بۆ دابەشکردنی دەسەڵات لەناوخۆی کەرکوکدا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو تا سەرکردە عێراقییەکان دەگەنە تەوافوقێك لەسەر بۆچوونەکانی بارودۆخی هەمیشەیی لەو شارەدا. جێگای سەرسوڕمان نییە، ڕاپۆرتەکەی (یۆنامی) زۆر بە سەختی سەرکردە کوردەکانی نیگەران و تووڕەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بەخوێندنەوە بۆ ڕاپۆرتی پشتگیری تاکە هاوپەیمانیان، ویلایەتە یەکگرتووەکان، نەیانتوانی ئەو ئەنجامە ڕەتبکەنەوە کە پێیگەیشتوون.

هەروەها (حکومەتی مالکی) گڵۆپی سەوزی داگیرساند.

لەراستیدا، لەوکاتەوە هەندێ هەنگاونراوە، بەڵام لە عێراقدا، حەقیقەتەکە ئەوەیە تاکو ئێستا قسەکردنی نێوان (بەغدا) و (هەولێر) وەکو نیعمەتێك سەیردەکرێت. هۆکاری ئەوەی کە تائێستا سیاسەتی نوێ ئەمریکا نەکەوتووەتەوە بواری جێبەجێکردنەوە ئەوەیە کە ئیدارەی ئۆباما نایەوێت هەواڵی ناخۆش بڵاوبکاتەوەو بیداتە مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان، نەوەك کوردەکان بایکۆتی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان بکەن و بەهۆی بێزاریان لە خشتەی کاتی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا. هەروەها نایەوێت پاڵەپەستۆ بخاتەسەر حکومەتەکەی مالیکی بۆ ئەوەی وای لێبکات سازشی ئازاربەخش بکات ڕوونیشەکە حاڵەتی تایبەت دەرەنجامی هەڵبژاردنی مالیکی نییە، بەتایبەت کە ئێستا لە سەرووبەندی هەڵبژارنەکانین. دیپلۆماتکارەکانی سەربە ئەمریکاو نەتەوەیەکگرتووەکان پێشنیاری ئەوەیان کردووە کە هەرچۆنێك بێت ئەوان نیازی ئەوەیان هەیە کە کێشەی کەرکوك بەشێوەیەکی جددی یەکلایی بکەنەوە ڕاستەوخۆو بەزووترین کات دوای ئەوەی براوەکان دەزانرێن و پێش ئەوەی حکومەتی نوێ پێك بهێنرێت. لە هەمان کاتدا، ئەوان حساب بۆ ژمارەیەك هەنگاودەکەن کە لایەنەکان لە یەکتر نزیك دەکاتەوە، لەسەر بنەمای یاساو پرەنسیپەکانی دەستوور (بەتایبەت لەو ماددانەی کە پێدەچێت هەموو لایەك پێی ڕازی بن)، لەوانە داهاتی هەموو فرۆشەکانی نەوت پێویستە بەیەکسانی بەسەر هەموو دانیشتووانی عێراق دابەشبکرێت، هەروەها تێکەڵکردنی پاسەوانانی هەرێمی کوردستان لەگەڵ سوپای فیدراڵی پێش ئەوەی دەستبکەن. بە ورووژاندنی کێشەی تایبەتی کەرکوك. ئەوان هیواخوازن کە هەنگاوی لەو شێوەیە کاریگەری هەبێت، ئەوان هەروەها دەتوانن ئاسانکاری بکەن بۆ پێکهێنانی حکومەتێکی بنکە فراوان بە ڕەشکردنەوەی بەربەستی کەرکوك.

کوردەکان هەست بەبێزاری دەکەن دوای زیاتر لە هەشت ساڵ لە گەڕان بەدوای سەربەخۆیی، لەگەڵ سیاسەتی هەڵەی سەدام، کوردەکان بینیان کە چانسێکیان هەیە بۆ بەرەپێشچوونێکی جددی، بۆیە هەموو هێزو توانای خۆیان لەپێناو کەرکوك خستەگەڕ. پەنجەرەی هەلی ئەوان لە ساڵی (١٩٩١) کرایەوە لە ساڵی (٢٠٠٣) فراوانتربوو، بەڵام لە ئێستادا واپێدەچێت بەرەو داخران بڕوات. ئەنجامەکە زۆر ناخۆش دەبێت. هەوڵەکان بۆ لەباربردنی ئەوەی کوردەکان بەدەستیان هێناوە. دەبێتە هۆی ناسەقامگیری. هەمان شت ڕوودەدات ئەگەر کوردەکان هەوڵی ئەوەبدەن کە کۆنترۆڵی تەواو بەسەر کەرکوکدا بکەن.

تەنها ڕێگای ژیرانە بۆ چوونەپێشی هەموو گرووپەکان ئەوەیە کە ڕێگای یاسایی بەرامبەر یەکتر بگرنەبەرو بەیەکەوە دابنیشن و بەدوای ڕێککەوتنێکدا بگەڕێن. ڕێککەوتنێك بێت نەك تەنها لە سنووری کەرکوك قەتیس ببێت، بەڵکو دەتوانێت چارەسەری ئەو کێشانە بکات کە پەیوەستە بە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئابووری نەوت و چۆنیەتی دابەشکردنی داهاتەکەی، هەروەها چۆنیەتی دابەشکردنی هێز لەنێوان هەرێمی کوردستان و تەواوی عێراق. سەرکردە کوردەکان پێویستە بڕیاری ئەوەبدەن کە کامیان بەبەهاترە لەلایان: ئاسایشی درێژخایەنی هەرێمەکەیان، لەگەڵ گرەنتی نێودەوڵەتی بۆیان، یانیش فراوانکردنی هەرێمەکەیان کە ئەو هەڵسوکەوتە تەنها توندوتیژیو شەڕی ناوخۆیی لێدەکەوێتەوە.

پێویستە ئامانجی هەموو یاریزانەکان بڵاوکردنەوەو دارشتنی پلانی درێژخایەن بێت بۆ ڕێگەگرتن لە ڕوودانی توندوتیژی لەنێوان پێکهاتە جیاوازە کلتوریو نەتەوەییەکان، دابەشکردنی دەسەڵات بەشێوەیەکی یەکسان لەنێوان پێکهاتە جیاوازەکان، هاندانی وەبەرهێنان لە کێڵگە نەوتیو گازیەکانی. سەرلەنوێ دروستکردنەوەی ئابوورییەکەی، پاراستنی مافو سەروماڵی هەموو ئەو خەڵکانەی لەوێ دەژین، گوێنەدان بە مێژووی ڕابردوو، هەروەها بەجێهێڵانی داهاتووی حاڵەتی کەرکوك بە کراوەیی ئەگەر ژینگەکە لە باربوو. خەڵکی کەرکوك کە بەشێوەیەکی زۆر پشتگوێخراون و لە بیرکراون لە جەنگی سیاسی نێوان بەغداو هەولێر شایەنی لەوە کەمتر نین. تەنها چارەسەرێکی ئاشتیخوازانەی مامناوەند بۆ حاڵەتی کەرکوك گرەنتی مانەوەی عێراق بە یەکگرتووی دەدات و بەمشێوەیەش لەدوای کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکاش تووشی نارەحەتی ئەوتۆ نابنەوە"[٢].

١. ڕۆژنامەی (ئاسۆ)، ژمارە (١١٢٠)، (٢١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٩). لاپەرە (٤ – ٥).
٢. ڕۆژنامەی (ئاسۆ)، ژمارە (١١٢٤)، (٢٧)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٩). لاپەرە (٤ – ٥).

## * بانگەوازی دەریاری مردوو دەربارەی کەرکوك* :

دەرئەنجامەکانی وەرشەی کاری کە هەریەك لە (ئەنجومەنی پارێزگاری کەرکوك) و کەسایەتییە کەرکوکییەکان لە ئوردون بەشدارییان کرد.

لەسەر بانگهێشتی دەزگای (فریدریش ناومان لەپێناو سەربەستی) کۆڕێکی لەژێر ناونیشانی (خۆئامادەکردنی دەسەڵات لە پارێزگای کەرکوك) لە (٣٠)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٨) لە ئوتێلی (مۆفینبك) لە هاوینەهەواری دەریای مردوو لە ئوردون بەست بە سەرپەرشتی ئەندامەکانی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك و بەرپرسە کارگێرییەکانی پارێزگا و کەسایەتی هەموو پێکهاتەکانی پارێزگاکە کە ژمارەیان (٢٣) کەسایەتی بوو، لە پاڵ گەلێك شارەزای تایبەت لە بواری چارەسەرکردنی کێشە دەوڵەتییەکان، کە بۆ ماوەی شەش رۆژ بەدەوام بوو، بەڵام لە دەرئەنجامدا بە گەلێك راسپاردەی گرنگەوە دەرچوو کە خۆی دەبینێتەوە لەم خاڵانەی خوارەوە:-

١. جێبەجێکردنی بیروبۆچوونی دابەشکردنی دەسەڵات.
٢. پشتگیریکردنی ئەو لیژنەیەی کە دامەزراوە لەلایەن ئەنجومەنی پەرلەمانی عێراقی بەپێی ماددەی (٢٣) لە یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان.
٣. چالاککردنی رێکەوتنی دووی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٧) کە لە ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك بریاری لەسەر دراوە.
٤. دژایەتیکردنی گەندەڵی و چاکسازی دەزگا کارگێرییەکانی پارێزگاکە.
٥. هەوڵدان بۆ بەرزکردنی ئاستی پێویستی و خزمەتگوزارییە گشتییەکان و چاککردنی باری ئابووری پارێزگاکە.
٦. پشتگیریکردنی وەبەرهێنان و بەدەستهێنانی بواری کارو پشتگیری کەرتی تایبەت.
٧. پەلەکردنی لە چارەسەرکردنی کێشەکانی موڵکدارێتی زەوی و زار.
٨. رێزگرتن و پارێزگاری کردنی ماف مرۆڤ و سەربەخۆیی دادوەری.
٩. دووبارە ئاوەدانکردنەوەی قەزاو ناحییە رووخاوەکان و گەرانەوەی خەڵکە راگوێزراوەکەی.
١٠. چالاککردنی ماددەی (٤) لە دەستووری عێراق بە تایبەتی لە برگەی تایبەت کە هاوپەیوەستە بە زمانی تورکمانی و سریانی.

بەشداربووانی ئەم چالاکییە بریتی بوون لە:

١. عیماد یۆخەنا یاقۆ، بەرپرسی لقی کەرکوکی (الحركة الديمقراطية الآشورية).
٢. ئاشور یەلدا بنیامین، ئەنجامی لیژنەی باڵای جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠).
٣. ئەحمەد حەمید ئەلعوبێدی، راگری گشتی (كتلة الوحدة العربية) لە کەرکوك.
٤. عەبدوڵڵا سامی ئەلعاسی، ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك.
٥. محەمەد خەیرەددین نازم ئەلعاسی، یەکێك لە شێخەکانی هۆزی (عوبێد).
٦. حەسەن عەبد نسەیەف، سەرۆکی ئەنجومەنی ناحیەی (یایچی).
٧. خومەیس زێدان، پەیوەندیداری دەزگای (فریدریش ناومان).
٨. راکان سەعید ئەلجبوری، جێگری پارێزگاری کەرکوك.
٩. محەمەد عەبدولواحید ئەلدووری، نوێنەری حیزبی ئیسلامی عێراقی لە حەویجە.
١٠. خدر ئەکبەر حەسەن گسەیر، بەرێوەبەری (مركز كركوك الوطني للحوار والانماء الاجتماعي).
١١. عەلی مەهدی سادق، ئەندامی پێشووی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك لەسەر لیستی تورکمانی.
١٢. جەمال شان، سەرۆکی (الحزب الوطني التركماني) لە عێراق.
١٣. حەسەن تۆران، ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك.
١٤. ئیدریس قاسم، بەرپرسی لقی کەرکوکی (الاتحاد الإسلامي لتركمان العراق).
١٥. مونیر بورهان رەشید، سەرۆکی ئەنجومەنی قەزای کەرکوك.
١٦. محەمەد کەماڵ، ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك.
١٧. شێرزاد عادل، ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك.
١٨. ئاوات محەمەد ئەمین، ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك.
١٩. بابەکی سدیق، ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك.
٢٠. ئەلماس فازل، ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك.
٢١. ئیبراهیم خەلیل، ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك.
٢٢. رزگار عەلی حەمە جان، سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك.
٢٣. ئازاد شێخانی، راگرتنی کۆلێژی تەکنیکی لە سلێمانی.

* سەرچاوە:-
- گۆڤاری (الحوار والانماء)، ژمارە (١٢)، زستانی ساڵی (٢٠٠٨)، لاپەرە (٥ - ٦).

*** تەنگژەی کەرکوك:**

**لیام ئاندرسن**

مادەی (١٤٠) بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی ئاڵۆز (داهاتووی کەرکوك و ناوچە دابڕێنراوەکان نووسراوە) و شکستهێنانیشی خزمەت بە ڕزگاربوون لە کێشە بنەڕەتییەکە ناکات.

جاگەر بخوازرێت چارەسەرێکی باش بۆ ئەو کێشەیە بدۆزرێتەوە کە بۆ عێراق جێگەی بایەخێکی زۆرە، ئەوا گرنگە بزانرێت کە بۆچی ماددەی (١٤٠) بێتوانا بووە لە دەستەبەر کردنی ئەو چارەسەرەدا.

بێگومان کاری کۆمەڵێك فاکتەر ڕۆڵیان هەبووە لە شکستی ماددەی (١٤٠)دا لەوانەش ئەو ئاڵۆزییە یاسایی و لۆجستییەی کە پرۆسەکە هەیەتی، ئەمە جگە لە هەڵکشانی هێزی دژ بەماددەی (١٤٠) لەسەر ئاستی فیدراڵی و بەرتەسکبوونەوەی نفوزی پارتە کوردییەکان.

هەروەها دەکرێت بووترێت کە پشت بەستنی سەرانی کورد بەستراتیژێکی هەڵە دیسان پشکی هەبووە لە شکستهێنانی ماددەی (١٤٠). بەڵام فاکتەری یەکلایی کەرەوە دەقی ماددەکە خۆیەتی. بەواتایەکی تر ماددەی (١٤٠) بۆ خۆی ئامرازێکی گونجاو نیە بۆ ئەوەی کورد ئامانجەکانی خۆی بەدەستبهێنێت.

*** ئاڵۆزییە یاسایی و لۆجستییەکانی ماددەی (١٤٠):**

لە رووی تیۆرییەوە بەندەکانی ماددەی (١٤٠) زۆر سادەیە، بە جۆرێك ئەو کەسانەی کە ڕژێمی پێشوو دووری خستوونەتەوە یان رایگواستوون دەگەڕێنرێنەوە سەر ماڵ و موڵکی خۆیان، هەروەها ئەو کەسانەش کە تازە هێنراونەتە ناوچە دیاریکراوەکان، بگەڕێنرێنەوە بۆ سەرزێدی ئەسڵی خۆیان و نیشتەجێبکرێنەوە، وەك قەرەبوو کردنێکیش پارچەیەك زەوی و بڕێك پارەیان پێبدرێت، لەگەڵ دۆزینەوەی چارەسەر بۆ گۆڕینی سنووری ئیدارەی پارێزگاکە، کە لەلایەن ڕژێمی پێشووەوە وەك زوڵمێك دەستکاریی کراوە. تەواو کردنی ئەو قۆناغەش بەر لە گەیشتن بە چارەسەری هەمیشەیی (ناوچە دابڕاوەکان لەوانەش کەرکوك کارێکی پێویست بوو).

خۆ ئەگەر بۆ کاتێکی کەمیش بێت چاوپۆشی لە گرفتەکانی هەردوو قۆناغەکانی تر بکرێن لەگەڵ ئەوەی ئەم بەندانە سەرجەم ناوچە دابڕاوەکان دەگرێتەوە ئەوا جێبەجێکردنی قۆناغی یەکەم لە پرۆسەکە دووچاری ئاڵۆزی تەکنیکی و لۆجستی بوەوەو باڵاترین دەزگای لێهاتووی ئیداریشی هیلاك دەکرد.

لە کۆی ئەو چوار ڕەگەزە کە پرۆسەکە لە خۆی دەگرێت (گەڕانەوەی ڕاگوازراوەکان، زۆربەیان کوردن، سەر لە نوێ نیشتەجێکردنەوەی هاوردەکان (الوافدین) کە زۆربەیان عەرەبی شیعەن)، لەگەڵ چارەسەری کێشەی موڵکدارێتی و گەڕانەوەی سنووری ئیداری کەرکوك بۆ بەر لە دەستکاریکردنی لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە، دەسەڵاتدارانی کورد تەنیا دەسەڵاتی زۆریان بەسەر ڕەگەزی یەکەمدا هەبوو.

دوا بەدوای کەوتنی کەرکوك لەلایەن هێزی هاوپەیمانانەوە گەڕانەوەی کوردانی ڕاگوازراو دەستپێکرد و زۆری گەڕاوەکانیش بێ خانوو و ماڵ بوون لە شارەکەدا. هەر بۆیە کێشەی موڵکدارێتی لە ئارادا نەبوو بەڵام دیسان قەزاو ناحیە کوردییەکانی دەرەوەی کەرکوکیش ئەم گرفتە گەورەیە نەبوو، چونکە عەرەبی هاوردە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بەر لە گەڕانەوەی دانیشتووانە ڕەسەنەکەی کە کورد بوون ئەو جێگایانەیان بەجێهێشتبوو.

ئەو مەسەلە لۆجستیانەی کە پەیوەستبوون بە ووردبوونەوە لە دەیان و بگرە سەدان هەزار کورد لە دەستەبەرکردنی پێداویستی بنچینەیی وەك کارەبا و شوێنی نیشتەجێبوون و چاودێریی پزیشکی و تۆڕی ئاو و ئاوەڕۆی پێویست هەموو ئەوانە سەر لە نوێ ئاوەدانکردنەوەی ژێر خانی کەرکوکیان دەخواست، بەڵام هەرگیز نە ویلایەتە یەکگرتووەکان و نە حکومەتی عێراقیش سەرچاوەی دارایی دابین دەرکرد.

کورتهێنان لەو بودجەیەی کە حکومەتی عێراقی بۆ کەرکوکی تەرخان دەکرد بەواتای ئەوەی کە دەبوو حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ڕێگەی پارتە کوردییەکانەوە سوود بە ژێرخانی ئابووری کەرکوك بگەیەنێت، دواتریش لەلایەن ئەمریکاوە لە ڕێگەی بەرنامەی تیمەکانی سەر لە نوێ ئاوەدانکردنەوەی پارێزگاکانەوە هاوکاری ژێرخانی ئابووری کەرکوك دەکرا.

لەگەڵ ئەوەی گرفتەکانی پەیوەست بەراگوازراوانی کورد لەسەر ئاستی جێبەجێکردنی قۆناغی ئاسایی کردنەوە لە ماددەی (١٤٠) گرفت گەلێکی سادەی ئیداری بوو بەڵام پارتە کوردییەکان کە کۆنترۆڵی بەڕێوەبەرایەتییە پەیوەندیدارەکانیان کردبوو لە توانایاندا هەبوو زەوی دابین بکەن بۆ ئەو کوردە گەڕاوانەی کە پێویستیان پێی بوو، لە کاتێکدا زۆربەی گەڕاوەکان لە پارێزگا کوردییەکانی ترەوە گەڕابوونەوەو ئەوەش گرفتی گواستنەوەی بەڵگەنامەکانی تەواو کەمکردبووەوە.

چارەنووسی ئەوەی کە بە (هاوردە)کان ناودەبران تەحەدییەکی لۆجستی زۆر گەورەتر بوو بە جۆرێك دەبوو جیاوازی بکرێت لەنێوان توێژە جیاوازەکانی هاوردەکاندا. ئەوەبوو زۆرێکیان لەو گەڕەکانەدا نیشتەجێ کرابوونەوە کە لەلایەن ڕژێمی پێشووەوە دروستکرابوون لەپێناو کار ئاسانی پرۆسەی تەعریبکردنی شارەکە، لە کاتێکدا بەشێکی تریشیان ڕاستەوخۆ جێگەی دانیشتووانی ڕەسەنی شارەکەیان گرتبووەوە.

توێژی سێیەمیش لە هاوردەکان هاتبوون بۆ کڕینی ئەو موڵك و ماڵانەی کە لە پاش دوورخستنەوەی خاوەنی ئەسڵی چەند دەستێکی کردبوو.

بێگومان ناچارکردنی هاوردەکان بە ڕۆیشتن یاخود بەجێهێشتنی شارەکە بە خواستی خۆیان پرسێکی پڕ لە

مشتومر بوو. قەرەبوو کردنەوەی ئەوانەی کە بۆ خۆیان بەجێهێشتنی شارەکە هەڵدەبژێرن پێویستی بە بڕیارێکی سیاسی هەبوو بۆ ئەوەی قەبارەی قەرەبووکردنەوەکە دیاری بکات، کە ئەوەش تەنیا لە ئازاری ساڵی (٢٠٠٧)دا بڕیاری لەسەردراو بۆ ئەو مەبەستەش پارەی پێویستی بۆ تەرخان کراو ئەو کارەش لە کۆتاییەکانی هاوینی ساڵی (٢٠٠٧)دا بە دیهاتو پرۆسەی دەرکردنی چەکی بانکیش لە (٣٠)ی ئەیلولی هەمان ساڵ بۆ ئەو خێزانە عەرەبانە دەرچوو کە لە کەرکوك دەڕۆیشتن.

جگە لەوەش پرۆسەکە پێویستی بەهاوکاری چالاکانەی فەرمانبەرانی پارێزگا ئەسلییەکان هەبوو بۆ گواستنەوەی کارتی نیشتەجێبوون و کۆبۆنی خۆراك و دابین کردنی زەوی بۆ گەڕانەوەیان.

لە زۆربەی حاڵەتەکانیشدا فەرمانبەرانی دەزگا بیرۆکراسییەکانی ئەو پارێزگایانە شیاوی ئەو ئەرکە نەبوون و ئارەزووی ئەوەشیان نەدەکرد کارەکان بۆ جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) رایی بکەن[1].

هەروەها پرۆسەکە پێویستی بەرەزامەندی وەزارەتە پەیوەندیدارەکانی عێراق هەبوو لەوانەش وەزارەتی ناوخۆ کە زۆرجار ئەو رەزامەندییە رادەگیرا[2]. یەکلایی کردنەوەی کێشەی موڵکدارێتی جۆرە ئاڵۆزییەکی لە خۆگرتبوو. دیارە سەرباری نوێکردنەوەی دەزگای ئیداری پەیوەست بەوکارە لە حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٤)دا بە فەرمانی دەسەڵاتی ئیئتلاف کاتی، بەڵام لەگەڵ هەڵپەساردنی ماددەی (١٤٠) کەیسەکانی پەیوەست بە کێشەی موڵکداری کە ژمارەیان تەنیا لە کەرکوکدا (٥٠) هەزار کەیس بوو، پێشکەوتنێکی ئەوتۆیان بەدەست نەهێنا کە پێویستیان بە گرتنە بەری رێکاری ئیداری هەبوو.

وەك رزگار عەلی سەرۆکی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك رایگەیاند: لەو پارێزگایەدا بە تەنیا کەمتر لە (٦٪)ی کێشەی موڵکدارێتی تا کۆتایی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٧) چارەسەرنەکراون، ئەمە جگە لە نەبوونی یارمەتی دارایی پێویست و کادێری ئیداریی لێهاتوو بۆ بە گەڕخستنی دەزگای بیرۆکراسی تایبەت بە سکاڵاکانی پەیوەست بە موڵکدارێتی. دیسان کێشەی گەورەی نێو پرۆسەکە لەوەدابوو کە لەسەر حیسابی لێهاتوویی و کارایی، ئەولەویەت درابووە دەستپاکی و شەفافیەت.

هاوکات بە پێی فەرمانێکی دەسەڵاتی ئیئتلافی کاتی کە لە حوزەیراندا دەرچوو بوو، سەرجەم سکاڵانی موڵکدارێتی پێویستی بە ئامادەکردنی راپۆرتێك هەبوو تا لەلایەن لیژنەی خۆجێی تایبەتمەندەوە لایەنی یاسایی ئەو کەیسە وەك ئەو واقیعەی کە هەیە لەگەڵ پاساوی لایەنە ناکۆکەکان و رێنمایی راوێژکاری لیژنەکە بە پوختی ئامادە بکرێت.

هەروەها دەکرێت ئەو یاسایەی کە دواتر لیژنەکە دەریدەکات لەماوەی شەش رۆژدا ئیستیئناف بکرێتەوە ئەویش لە رێگەی پێشکەشکردنی نارەزایی نامەیەك بە هۆبەی تەمییز لە بەغداو ئەوەی پێویستیشە لەسەر دادنووسی فەرمانگەی تەمییز ئامادەکردنی راپۆرتێکی تر دەبێت لەسەر ئەو کەیسەو پێشکەشکردنی بەدادگای تەمییز تا دوا بڕیاری خۆی لەو بارەیەوە بدات.

هەڵبەتە پرۆسەکە ووردو خاوێن بوو بەڵام شیاوی دەرکردنی بڕیارەکان نەبوو لە کاتی گونجاوداو پێویستە بۆ جێبەجێکردنی قۆناغی ئاساییکردنەوە لە ماددەی (١٤٠) لە ماوەیەکی دیاریکراودا[3].

رەنگە بکرایە لە رەوشێکی ئارامو لەگەڵ هاواری دەزگایەکی ئیداری لێوەشاوەو بە ئەزموون و دیسان لەگەڵ یارمەتی سیاسی و ئیداری لە گشت ئاستەکان پرۆسەی ئاساییکردنەوە بە پێی ماددەی (١٤٠) لە کاتێکی دیارکراودا بە ئەنجام بگەیەنرایە.

بەڵام عێراق کە لە شەڕی ناوخۆییدا نوقم ببوو دەوڵەتێکی شکستخواردوو بوو، هەرچی دەزگا ئیدارییەکەشی بوو لێوان لێو بوو بە گەندەڵی و کێشەکێشی دەستەو گرووپەکان.

ئەوەی کە بۆ کوردیش کوشندە بوو فەرمانبەرەکانی ئەم دەوڵەت بوو کە لەسەر گشت ئاستەکان فەرمانبەری بیرۆکراسی و دژ بە پرۆژەکانی کورد بوون لە کەرکوکدا.

### * پەرەسەندنی هێزی نەیاری دژ بە ماددەی (١٤٠):

لە سەرەتادا لەسەر ئاستی پارێزگا جۆرە سازاندنێکی رووکەش هەبوو سەبارەت بە زەرورەتی راستکردنەوەی هەموو ئەو تاوانانەی کە رژێمی پێشوو دەرهەق بە پێکهاتە ئیتنییکییە جیاوازەکانی کەرکوك ئەنجامیدابوو، بە جۆرێك کارئاسانی بۆ گەڕانەوەی کوردو تورکمان بکرێت بۆ سەر ماڵ و موڵکی خۆیان کە بە زۆرەملێی دەرکرابوون.

دیارە لەنێوان هەردوو پێکهاتەی کوردو تورکماندا بەرژەوەندی هاوبەش هەبوو، جگە لەوەش کورد رووبەڕووی دژایەتیکردنێکی گشتگیر بووەوە لە بەرامبەر هەوڵەکانی بۆ خۆسەپاندنی بەسەر شارەکەدا ئەویش لە رێگەی زیادکردنی ژمارەیانەوە.

هاوپەیمانی عەرەبی – تورکمانی کە لە ناوەڕاستی ساڵی (٢٠٠٣)دا سەریهەڵدا، هاوپەیمانێتیەکی نەرێنی بوو، واتە تەنیا پاساوی ئەو رێککەوتنە بۆ دژایەتیکردنی هەوڵەکانی کورد بوو لە کۆنترۆڵکردنی ئیدارەی شارەکەدا.

هەروەها هەردوولا پێکەوە سووربوونی خۆیان لەسەر رێگریکردن لە جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) بە گشتی وەك وەسیلەیەك پیشاندا، لەگەڵ ئەوەشدا هێزی نەیاری ناوخۆیی دژ بە ماددەی (١٤٠) راستەوخۆ هێندە بەرهەڵستکارێکی گرنگ نەبووە.

بایکۆتکردنی عەرەب و تورکمان بۆ ئەنجومەنی پارێزگاکە کوردی لەو شەرعیەتە بێبەش کرد کە پێویستیان پێی بوو لە مومارەسەرکردنی دەسەڵاتێکی ئەکتیڤدا.

دیارە دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنەکە دەسەڵاتێکی سنووردار بوو بە جۆرێك ئەو کەیسە بایەخێکی لاوەکی هەبوو. ئەو بایکۆتکردنە کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر ئەو دیدەی کە جیهانی دەرەوە لێیەوە لە ململانێی کەرکوکی دەڕوانی. بە جۆرێك هێزی دژ بە پرۆژەکانی کورد لە کەرکوك و یەکبوونی ئەو بەرهەڵستکارییە توانیان زۆرێك قایل بکەن بەوەی کە

سستبوونی پرۆسەی سیاسی بە پلەی سەرەکی دەکەوێتە ئەستۆی کوردەوە. بەو پێیەش ڕێگری کردنی کورد لە دابەشکردنی دەسەڵاتی یەکسان و وەك یەك لەگەڵ پێکهاتە ئیتنیکییەکانی تردا ڕەوایبوونی دۆزی کوردو گەڕانەوەی کەرکوك بۆ سەر هەرێم لاواز کرد[٤].

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. Kuurdistan Nuwe. ٢٠٠٧. (Iraq's kirkuk governor interviewed on onership. other issues). ٦ october (WNC).

٢. بۆ نموونە ساڵی (٢٠٠٧)، (جەواد پۆلانی) وەزیری ناوخۆی عێراق بە فەرمانێك گواستنەوەی بەڵگەنامەی باری کەسێتی لە پارێزگاکانەوە قەدەغە دەکات، ئەو فەرمانەش دوای ئەوەهات کە بە هۆی هەڵکشانی توندوتیژی تایەفییەوە پرۆسەیەکی ڕاگواستنی فراوان ئەنجامدراو ئەوەش ئەو بۆ کەسانەش بوون کە ماددەی (١٤٠) دەیگرتنەوە.

٣. ئامادەکردنی ئەم پرۆسەیە نموونەیەکی کلاسیکییە لەسەر دوورکەوتنەوەی ڕاوێژکارانی دەسەڵاتی ئیئتلاف کاتی لە شاری بەغدا لە ڕاستییەکانی ژیانی ڕۆژانە لە عێراقدا، بۆ ئاشنابوون بە چارەسەرەکانی ئەو دوورکەوتنەوانە، بڕوانە: Chandrasekaran. R. ٢٠٠٧. Imrerial life in the emerald city: inside Iraq's green zone. News York: Vintage.

٤. (تەنگژەی کەرکووك)، لیام ئاندرسن، وەرگێڕانی: ئومێد عوسمان، چاپخانەی موکریانی، هەولێر، ٢٠١٣، لاپەڕە (٢٨٧ – ٢٨٨).

## * ڕێککەوتننامەی بەرلین* :

لە بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیا لە ژێر ناونیشانی (جێبەجێکردنی ڕاگەیاندنی دەریای مردوو: چارەسەرێکی دادپەروەرانەو قابیلی درێژەپێدان بۆ ئەو بەرەنگاربوونەوانەی مەسەلەی حوکم لە کەرکوك دەیانخاتەروو) لە (٢٨) بۆ (٣٠) نیسانی ساڵی (٢٠٠٩) لەسەر بانگهێشتی دامەزراوەی (فریدریش ناومن بۆ ئازادی)و بە بەشداری سەرکردە سیاسییەکان ووۆرکشۆپێك ڕێکخراوو بەشداربووان لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕێککەوتن:

یەکەم: ئیدانەو مەحکومکردنی توندی ئەو کارە توندوتیژو تیرۆریستییانەی بەمدواییانە لە کەرکوك ئەنجامدران، چونکە بە هێرش بۆ سەر سەرجەم خەڵکی کەرکوك و دەستدرێژی بۆ سەر هەستی مرۆڤایەتی هاوبەش و پێکەوەژیانی ئاشتیانە لە کۆمەڵگەی کەرکوکدا دادەنرێت و ئێمە سەرەخۆشی گەرم پێشکەش بە گیان و خانەوادەی ئەو کەسە بێتاوانانە دەکەین کە گیانیان سپارد و لە چاکبوونەوەی تەواویش بۆ بریندارەکان لە خودا داواکارین.

دووەم: تەئکیدکردنەوە لەسەر پابەندبوون بە بنەماو دەقەکانی ڕاگەیاندنی دەریای مردوو و جێبەجێکردنی بە شێوەیەکی کاراو تەواو بۆ بەرژەوەندی سەرجەم خەڵکی کەرکوك و بەردەوامبوون لەسەر کاری جدی لە ڕێی گرتنە بەری ڕێ و شوێنی ڕاوێژکاری بەو جۆرەی جێبەجێکردنی سەرجەم برگەکانی ئەو ڕاگەیاندنە زامن دەکات.

سێیەم: دانپێدانان و بە شێوەیەکی تایبەتیش بە بایەخ و بەهای جێبەجێکردنی ڕێوشوێنەکانی دابەشکردنی دەسەڵات کە لە ڕێکەوتنی (٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٧) دا هاتووەو لە ڕاگەیاندنی دەریای مردوودا پتەوکراوەو هەروەها ئەوەی لە ماددەی (٢٣)ی یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکاندا هاتووە.

چوارەم: بۆ هێنانەدی ئەوەش، ڕەزامەندی درا لەسەر جێبەجێکردنی ڕێوشوێنەکانی دابەشکردنی دەسەڵات ئەوەی پەیوەندی بە پۆستە گشتییەکانەوە هەیە وەك ئەوەی لە خوارەوەی وورد کراوەتەوە:

١. بانگهێشتکردنی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك بۆ بەستنی کۆبوونەوەیەکی نائاسایی بە ئامادەبوونی سەرجەم لیستەکان بەمەبەستی پەسەندکردنی:

أ. پابەندبوون بە کاراکردنی ڕێکەوتنی (٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٧)و ڕاگەیاندنی دەریای مردوو و پشتیوانییکردنی لیژنەی ماددەی (٢٣) لە یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان سەبارەت بەوەی پەیوەندی بە دابەشکردنی دەسەڵاتەوە هەیە.

ب. پێکهێنانی لیژنەیەك کە سەرجەم لیستەکان و (پارێزگار یان هەر کەسێك لە نوێنەرایەتی بکات و بە ئامادەبوونی نوێنەری unami) لە خۆبگرێت، ئەم لیژنەیەش ئەم کارانە دەکات:

یەکەم: گرتنەبەری سەرجەم ڕێوشوێنە تەکنیکی و زانستییەکان بۆ کۆکردنەوەی ئەو زانیارییانەی پەیوەندییان بە پێکهاتەی فەرمانگەکان و ژمارەی بەڕێوەبەرە گشتییەکان و بەڕێوەبەرەکان و سەرۆك بەش و لقەکانەوە هەیە لەگەڵ باسکردنی زانیارییە تایبەتەکانی هەر فەرمانبەرێك و ئەو پۆستەی کە تێیدایە.

دووەم: پۆلێنکردنی پۆستەکان بە پێی گرنگییان.

سێیەم: هاوئاهەنگی لەگەڵ دەسەڵاتی فیدراڵی.

٢. پەسەندکردن و جێبەجێکردنی ئەم پرەنسیپانەی خوارەوە سەبارەت بە جێبەجێکردنی دابەشکردنی دەسەڵات لە پۆستەکاندا:

أ. یەکسانی هاوسەنگی و دادپەروەری بە جێبەجێکردنی ڕێژەکانی (٣٢، ٣٢، ٣٢، ٤)یشەوە.

ب. زامنکردنی مافە دەستوورییەکانی هاووڵاتیان بە تایبەتی جیاوازی نەکردن، واتا کەس پۆستەکەی لە دەستنادات لە ئەنجامی ئەم ڕێوشوێنانەدا.

ت. لێهاتوویی و پسپۆڕی.

پ. بانگەوازکردن بۆ پۆستە بەتاڵەکان بەشێوەیەك کە هەمووان بتوانن ئاگاداری بن.

ج. گونجاوی سەبارەت بەوەی پەیوەندی بە واقیعی دانیشتووانی ناوچەکانەوە هەیە.

٣. دابەشکردنی ئەم پۆستە سیادییانە (پارێزگار، جێگری پارێزگار، سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگا) بە گوێرەی ڕێکەوتنی (٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٧)و ماددەی (٢٣) لە یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان.

٤. دابەشکردنی پۆستە باڵاکان بە پێی ڕێژەکانی (٣٢، ٣٢، ٣٢، ٤) بە لەبەرچاوگرتنی ڕیزبەندی گرنگی ئەو پۆستانە.

٥. دابەشکردنی پۆستە ناوەندییەکان و بەرەوخوار بە پێی ڕێژەکانی (٣٢، ٣٢، ٣٢، ٤)و ئەو پرەنسیپانەی لە خاڵی (٢)ی سەرەوەدا هاتووە.

٦. دابەشکردنی ڕێژەکانی (٣٢، ٣٢، ٣٢، ٤) بەسەر دامەزراوە حکومییەکاندا.

٧. جێبەجێکردنی پرۆسەی بەشداریکردن لە دەسەڵاتی ئیداری و ئەمنی و پۆستە گشتییەکاندا:

أ. بە پێی چوارچێوەیەکی زەمەنیی کە لە نزیکترین کاتدا لەلایەن دەسەڵاتە پەیوەندیدارە تایبەتمەندەکانەوە ڕێککەوتنی لەسەر دەکرێت، بەمەرجێك ڕەنگدانەوەی پێداویستییە هەنوکەییەکان و بەرژەوەندی هەموو پێکهاتەیەك لە پێکهاتەکانی کەرکوك بێت.

ب. هاوئاهەنگیکردن لەگەڵ دەسەڵاتە پەیوەندیدارەکان (ئەنجومەنی نوێنەران و دەسەڵاتی جێبەجێکردن و ئەنجومەنی پارێزگا) بەو جۆرەی زامنی مافەکانی سەرجەم پێکهاتەکان بکات.

ت. ئەمە زامن دەکرێت لەلایەن دەسەڵاتەکانی یاسادانان و جێبەجێکردنەوە لەگەڵ ڕێوشوێنە یاساییەکاندا.

پێنجەم: ئاگادارکردنەوەی لیژنە پەرلەمانییەکەی تایبەت بە ماددەی (٢٣) لە ناوەڕۆکی ڕێککەوتنەکەی بەرلین.

(*) ڕۆژنامەی (ئاسۆ)، ژمارە (٩٦٥)، (٥)ی ئایاری ساڵی (٢٠٠٩)، لاپەڕە ٢.

*** رێککەوتننامەی هلسنکی، کاراکردنی چارەسەری کێشەکانی کەرکوک:**

**جەمال سەعید**

"بە سەرپەرشتی (ئەیاد سامەرائی) سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق دانیشتنی کۆنگرەی نیشتمانی لە بارەی کەرکوک (رێکەوتننانەی هلسنکی و ئایندەی کەرکوک) رۆژانی (١٩ - ٢١)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٩) بەڕێوەچوو، بە بەشداری ژمارەیەك لە پەرلەمانتارانی عێراق و پەرلەمانی کوردستان و ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك.

سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران ئاماژەی بەوەکرد کە یەکێك لەو کێشانەی لە عێراقدا سەریهەڵداوە بریتیە لە کێشەی کەرکوك کە چەندین کۆنگرە بۆ چارەسەرکردنی سازکراوە، بەڵام نەبوونی بەدواداچوون بۆ ئەو کۆنگرانە بۆتە هۆکارێك کە بەرهەمدار نەبێت، ڕوونیشیکردوەوە کە ئەم کۆنگرەیە پشت دەبەستێت بەو پەیماننامەیەی کە لە کۆنگرەی (هلسنکی) بۆ ئاشتەوایی نیشتمانی ئیمزاکراوە کە کاتی خۆی کۆنگرەیەکی سەرکەوتوو بوو، پێداگری لەسەر ئەوەشکرد کە دەبێت عێراقییەکان لەسەر خاکی وڵات کۆببنەوە بۆ وتوێژکردن و گەیشتن بە ئاشتەوایی نیشتمانی راستەقینە.

*** عەرەب و تورکمان بە (کوردیی) سەغڵەتبوون:**

هەروەك (کەمال کەرکوکی) سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان لە وتەیەکیدا پێداگریکرد لەسەر پێکەوەژیانی برایانە لەنێوان پێکهاتەکانی پارێزگای کەرکوك، ئاماژەی بەوەدا رۆڵە رەسەنەکانی کەرکوك چارەسنووی خۆیان دیاردەکەن بە شێوەیەکی دیموکراتیانە بە بێ زۆرلێکردن، دووپاتیشکردوەوە کە پارێزگای کەرکوك لە چوارچێوەی نەخشەی عێراقدا دەمێنێتەوە هەر چەندە ئەگەری جیاواز هەبێت لە بارەی ئایندەی ئەم پارێزگایە، هەروەك داکۆکی لەسەر ئەوەشکردەوە کە نەخشەی رێگای چارەسەری کەرکوك بریتییە لە مادەی (١٤٠)ی دەستوور.

لە کاتێکدا (کەمال کەرکوکی) وتەکەی پێشکەش دەکرد تورکمان و عەرەبەکان کۆنگرەکەیان جێهێشت لەبەر ئەوەی بە زمانی کوردی قسەیکردو داکۆکی لەسەر مادەی (١٤٠)ی دەستوور کردەوە، بەڵام شارەزا بیانییەکانی بەشدار لە کۆنگرەکە ئەوەیان خستەڕوو کە بوونی زمان جیاوازو پاراستنی هەرلایەك بە زمانی خۆی کارێکی ئاسایی و نموونەی چەند وڵاتێکیشیان لەمبارەیەوە خستەڕوو.

*** گەران بە دوای دۆزینەوەی چارەسەردا:**

لەلایەن خۆیەوە پەرلەمانتار (هاشم تائی) سەرۆکی لیژنەی هەرێم و پارێزگاکان لە ئەنجومەنی نوێنەران رۆونیکردەوە کە کۆنگرە تاووتوێی چارەسەری کێشەی کەرکوك ناکات، بەڵکو گفتوگۆ دەکات لە بارەی پێکهێنانی ئەنجومەنی دیالۆگ، هەروەك تاووتوێی چارەنووسی کەرکوك دەکرێت پاش ئەوەی هێزەکانی فرەرەگەز پاشەکشە دەکەن، داواشی لە بەشداران کرد بە شێوەیەکی بابەتییانە تاووتوێی سەرجەم دۆسییەکان بکەن، ئەوەشی خستەڕوو کە چەند شارەزاییەکی نێودەوڵەتی لە بواری ئاشتەوایی و چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان بەشداری کۆنگرەکە دەکەن تا هاوکارییەکانیان پێشکەش بکەن لە کاتی بەڕێوەچوونی گفتوگۆکان.

پەرلەمانتار (هاشم تائی) ئاماژەی بەوەکرد کە کۆنگرەکە لە سەرجەم لایەنە گرنگەکانی کێشەی کەرکوك دەکۆڵێتەوە لە چوارچێوەی کۆنگرەی (هلسنکی) بۆ ئاشتەوایی نیشتمانی و دواتریش راسپاردەکانی خۆی دەخاتەڕوو.

ڕوونیشیکردەوە کە تێروانینی فراوانی کۆنگرە بریتییە لە لێکۆڵینەوەی پێشنیاری دامەزراندنی (ئەنجومەنی دیالۆگ) لە نێو ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بە ئەندامێتی ئەوانەی ئیمزایان لەسەر کۆنگرەی (هلسنکی) کردووە لەگەڵ ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك و پەرلەمانی کوردستان یاخود پێکهێنانەکەی لە رێی پاڵاوتنی نوێنەری پێکهاتەکان بێت، وتیشی: "مەبەست لە پێکهێنانی (ئەنجومەنی دیالۆگ) بریتییە لە پێکهاتنی بۆچوونەکان لە بارەی چۆنیەتی بەرەو پێشچوونی کێشەی کەرکوك، ئەو ئەنجومەنەش کە بریارە پێکبهێنرێت راسپاردەکانی دەخاتە بەردەم ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق و پەرلەمانی کوردستان".

*** بریاری پێکەوەژیان:**

بەڵام (رزگار عەلی) سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك جەختیرکردەوە لەسەر ئەوەی رۆڵەکانی کەرکوك بریاری پێکەوەژیانیان داوە هەر بۆیە دەبێت دیالۆگ لەنێوانیانیدا بەردەوام بێت، ئاماژەی بەوەشکرد کە پارێزگاکە بە کەمی خزمەتگوزارییەوە دەناڵێنێت ئەمەش دەخوازێت لایەنەکانی راپەراندن کار بکەن بۆ پێشکەشکردنی پرۆژەی خزمەتگوزاری زیاتر بۆ هاووڵاتیان، داواشیکرد رۆڵەکانی پارێزگاکە بە مافی دەستووری خۆیان شادبن بە بەشداریکردن لە پرۆسەی دیموکراتی و دیاریکردنی نوێنەرەکانیان لەسەر ئاستی نیشتمانی و ناوخۆیی.

هەر یەك لە (پاتریك ئۆماڵی)و (جۆن ئەلدەردایس) و (راڵف مایەر)و (ئەلکساندەر ماکسی) شارەزایانی نێودەوڵەتی لە بواری ئاشتەوایی و چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی ووتەکانیان پێشکەشکردو لە بارەی ئەزموونە نێودەوڵەتییەکان دوان لە چارەسەکردنی کێشە و ناکۆکییەکان و بەدیهاتنی ئاشتەوایی نیشتمانی.

*** سێ گرووپ:**

لە کارەکانی رۆژی دووەمی کۆنگرەکەشدا ئامادەبووان دابەشکران بۆ سێ گرووپ، گرووپی یەکەم پێکهاتبوون لە ژمارەیەك لە ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق و گرووپی دووەمیش بریتی بوو لە ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك، بەڵام گرووپی سێیەم چەند ئەندامێکی پەرلەمانی هەرێمی

کوردستانی لە خۆگرتبوو، لە دانیشتنەکانی هەریەك لەو گرووپانەش شارەزایەکی نێودەوڵەتی لە بواری ئاشتەوایی نیشتمانیو یەکلاییکردنەوەی ناکۆکییەکان بەشداریکرد، دوو دانیشتنی دیکەش ئەنجامدرا بۆ تاووتوێکردنی ڕاسپاردەی هەریەك لەو گرووپانە.

*** پرۆژەکەی (هلسنکی):**

شایانی باسە پرۆژەی ئاشتەوای نیشتمانی لە (هلسنکی) بە دوو دیدار لە شاری (هلسنکی) لە وڵاتی (فلەندا) دەستپێکرد، دیداری یەکەم لە ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٧) بەڕێوەچوو، دیداری دووەمیش لە نیسانی ساڵی (٢٠٠٨) ئەنجامدراو سێیەم دیداریش لە هۆڵی زەورای میوانخانەی ڕەشید لە تەموزی ساڵی (٢٠٠٨) لە شاری بەغدا ئەنجامدرا بە بەشداری سەرۆكو نوێنەری پارتە سیاسییە عێراقییەکانو ئەوانەی بەشێوەیەکی سەرەکی بەشداربوون لە دانوستانەکانی ئاشتەوایی نیشتمانیو یەکلاییکردنەوەی کێشەکانی (باشووری ئەفریقیا) لە ساڵی (١٩٩٤)و (باکووری ئێرلەندا) لە هەردوو ساڵی (١٩٩٨)و (٢٠٠٦).

پرۆژەی (هلسنکی) پشت دەبەستێت بە بیردۆزو بنەمایەك کە پرۆفیسۆر (بیادریك ئۆماڵی) پەرەی پێداوە لە ماوەی کارکردنیدا لە ناوەندی (جۆزێف ماوکلی) بۆ ئاشتیو یەکلاییکردنەوەی کێشەکان لە زانکۆی (ماسۆشیست) لە (بۆستن).

ئەم بیردۆزە پشت دەبەستێت بە بنەمایەکی سەرەکی ئەویش بریتییە لەوەی کە ئەو گەلانەی بە قۆناغی ناکۆکیو شەڕو کوشتاردا تێپەڕبوونو پاشان ڕزگاریان بووە، باشتر دەتوانن هاریکاری گەلانی دیکە بکەن لە کۆمەڵگاکانی تردا کە هێشتا خەبات دەکات بۆ نەهێشتنی ناکۆکییەکان لە ناوخۆیاندا.

*** دیموکراتی لەبن چەتری ئاشتیدا:**

ئەم بیردۆزە بۆ یەکەمجار لە تەموزی ساڵی (٢٠٠٧) ئەزموونکرا، ئەوەبوو پرۆفیسۆر (ئۆماڵی) بە هاوکاری لەگەڵ حکومەتی (باشووری ئەفریقیا) کۆنگرەیەکی سازکرد لە ژێر ناونیشانی (ئەندابای گەورە)، لە کۆنگرەکەدا چوار نوێنەری چوار لە پارتە سیاسییە سەرەکییەکان ئامادەبوون لە کۆی دە پارتی (باکووری ئێرلەندا) بۆ دانوستانکردنو کۆبوونەوەکەش لە ناوچەی (ئارنیستون) لە (باشووری ئەفریقیا) کۆبوونەوە کە پێشتر لە ڕێی دانوستانەوە لە ساڵی (١٩٩٤) توانیبوویان ململانێکانیان یەکلاییکەنەوەو سیاسەتی ڕەگەزپەرستی کۆتایی پێبهێننو دواتریش حکومەتێکی دیموکراتیانە لە ژێر چەتری ئاشتیدا بنیاتنا، ئەو ئاشتەواییەی کە ئەوانەی لە جیهاندا باوەڕیان بە بەدیهاتنی هەبوو لە (باشووری ئەفریقیا) زۆر کەمبوون.

کۆنگرەکەش سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێناو بووە مایەی دەستخۆشی بەشدارانی (باکووری ئێرلەندا)و ئەوانەی کە ململانێکانیان یەکلاییکردەوە، دواتریش دووڕێککەوتننامەیان مۆرکردن کە بریتی بوو لە ڕێککەوتننامەی هەینی نوێ لە ساڵی (١٩٩٨) و ڕێککەوتننامەی (سنت ئەندرۆ) لە ساڵی (٢٠٠٦)، سوپاسگوزاری خۆشیان دەربڕی بۆ بەشدارای (باشووری ئەفریقیا) لەبەر ئەوەی ڕۆڵی ئیجابیو کاریگەرییان هەبوو لە پرۆسەی ئاشتەوایی لە (باکووری ئێرلەندا)و تا ئێستا ئێرلەندییەکان دەستخۆشی لەو پرۆسەیەو ڕۆڵی (باشووری ئەفریقیا) دەکەن.

*** (هلسنکی)و عێراق:**

ئەم بیردۆزە لە ساڵی (٢٠٠٧) ئاستێکی دیکەی بە خۆیەوە بینی، ئەوەبوو بیرۆکەیەکی نوێ پەیدابوو پاش سەرکەوتنو کاریگەری (باشووری ئەفریقیا) لەسەر پرۆسەی ئاشتی، هەر بۆیە کارێکی لۆجیکی بوو کە شارەزایانی (باکووری ئێرلەندا)و (باشووری ئەفریقیا) دەتوانن هاریکاریی عێراق بکەن لە ئاستێکی دیاریکراو لەنێوان سوننەو شیعەو ئاستێکی گەورەتر لەنێوان عەرەبو کورد بۆ دیاریکردنی کێشە مەزهەبییەکان لە ئاستی یەکەمو ململانێ نەتەوەییەکان لەسەر ئاستی دووەم، ئەوەش لە ڕێی پرۆسەی ئاڵوگۆڕی شارەزاییو ئەزموونەکان هاوشێوەی کۆنگرەی ئەندابای گەورە.

هەر بۆیە پرۆسەیەکی تایبەت بەم بیرۆکەیە دانراو پێشکەش بە بەشدارە سەرەکییەکانی کۆنگرەی (عێراق بەرەو چارەسەر) درا کە بە سەرپەرشتی (پەیمانگای سەرکردەیی) جیهانی لە زانکۆی (تفتس) لە (بۆستن) لە کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٧) سازکرا، هەموانیش کۆکبوون لەسەر پێویستی بەرەوپێشبردنی دەستپێشخەری قوتابخانەی (ماوکلی ماکۆرماك) بۆ لێکۆڵینەوەی سیاسی لە زانکۆی (ماسۆشیست)و (ناوەندی سەرکردایەتی) جیهانی لە (تفتس) و ناوەندی دەستپێشخەری بەڕێوەبردنی ناکۆکییەکان لە (هلسنکی) لە وڵاتی (فلەندا) کە لەلایەن (مارتی ئیهتساری) سەرۆکایەتی دەکرێتو خەڵاتی نۆبلی ئاشتی ساڵی (٢٠٠٨)ی پێبەخشراوەو باس لە گرنگی ڕۆڵیشی دەکرێت لە کۆنگرەی عێراق وەك یەکێك لە هۆکارەکانی بەخشینی خەڵاتەکە.

*** (١٦) سەرکردەکە:**

کۆنگرەی یەکەم لە شوێنێکی دەرەوەی (هلسنکی) لە مانگی ئابی ساڵی (٢٠٠٨) سازکراو تێیدا (١٦) کەس لە سەرکردەی پارتە سوننیو شیعەیەکانو چوار کەس لە دانوستکارانی (باکووری ئێرلەندا)و (باشووری ئەفریقیا) ئامادەبوون کە ڕۆڵێکی کاراو گرنگیان هەبوو لە گەیشتن بە یەکلاییکردنەوەی کێشەی وڵاتەکانیان، هەموو لایەك بەشداریانکرد لە نووسینەوەی ڕێککەوتننامەی (هلسنکی) یەکەم کە لە (١٢) بنەما پێکهاتبوو، لایەنە عێراقییە بەشدارەکان بڕیاریاندا بەوەی لە دانوستانەکانی داهاتوو پشتی پێببەستن.

کۆنگرەی دووەم لە (هلسنکی) لە مانگی نیسانی ساڵی (٢٠٠٨) بە بەشداری (٣٦) کەس لە نوێنەری سەرجەم پارتە

سیاسییە عێراقییەکان ئەنجامدرا لەگەڵ هەمان شارەزایانی (باکووری ئێرلەندا)و (باشووری ئەفریقیا)، لەم کۆنگرەیەشدا بنەما سەرەکییەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیە دانرا کە دواتر لە حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٨) لە عێراق ئیمزای لەسەرکرا.

*** (١٦) بنەما چارەسەر:**

بەڵام کۆنگرەی سێیەم لە بەغدا لە تەمووزی ساڵی (٢٠٠٨) سازکراو تێیدا ڕێککەوتننامەی (هلسنکی) پەسەندکراو هەریەك لە شارەزایانی (باکووری ئێرلەندا)و (باشووری ئەفریقیا)و نوێنەرانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی ئامادەبوون، پاشان شاندی (باکووری ئێرلەندا)و (باشووری ئەفریقیا) لەگەڵ سەرۆك (مام جەلال تالەبانی) کۆبوونەوەو کۆپیەك لە ڕێککەوتننامەکەیان خستە بەردەمی‌و ئەویش سوپاسی پێشکەشکردن بەرامبەر هاریکارییەکانیان لە پرۆژەی ئاشتەوایی عێراقدا، لە ڕێککەوتننامەکەدا (١٦) بنەما تۆمارکراوە کە سەرجەم عێراقییەکان لەسەری ڕێککەوتن تاوەکو پەنای بۆ ببەن لە کاتی دانوستانەکانیان لە کاتی کێشەکان، هەروەك (١٥) میکانیزم دانراوە بۆ جێبەجێکردنی ئەم بنەمایانە، ڕێککەوتننامەکەش خرایە نێو کارەکانی لیژنەی پێداچوونەوەی دەستوور.

*** پاش (هلسنکی) دانیشتنێك لە کۆنگرێسی ئەمریکی:**

لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٨) (ویلیام دیلهانت) ئەندامی کۆنگرێس سەرۆکی لۆنەی پەیوەندییەکانی دەرەوە لە ڕێکخراوە نیودەوڵەتییەکان‌و لیژنەی مافەکانی مرۆڤ‌و چاودێری کۆبوونەوەیەکی لە کۆنگرێس سازکرد‌و تێیدا ڕێکەوتننامەی (هلسنکی) لەلایەن شارەزایانی (باکووری ئێرلەندا)و (باشووری ئەفریقیا)و پرۆفیسۆر ئۆماڵیەوە ڕاڤەکرا.

*** پەسەندکردنی ڕێککەوتننامەکە لەلایەن ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك:**

لە مانگی ئایاری ساڵی (٢٠٠٩) ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك ڕێککەوتننامەکەی پەسەندکرد‌و ئەمەش ڕێگەی خۆشکرد بۆ ئەنجامدانی دیدارێك لەسەر ئاستی نیشتمانی لەنێوان ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك لەگەڵ ئەو سەرکردانەی پێشتر واژوویان لەسەر ڕێککەوتننامەی (هلسنکی) کردووە‌و تێڕوانینێکی هاوبەشیان هەیە ئەویش بریتییە لە پابەندبوونی هاوبەش بۆ گەڕانەوە بۆ ئەو پەیماننامەیە وەك بنەمایەك بۆ تاووتوێکردنی کێشە گرنگەکانی ئایندەی عێراق‌و بەدیهاتنی بەرقەراری‌و ئاسایش‌و دیموکراتی تێیدا کە تا ئێستا بە تەواوی چارەسەرنەکراوە یاخود سەرچاوەی دوودڵی قووڵی سەرکردە عێراقییەکانە.

*** کۆنگرەی نیشتمانی دەربارەی کەرکوك:**

لە ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٩) پرۆفیسۆر (ئۆماڵی) لەگەڵ (دکتۆر ئەیاد سامەرائی) سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران‌و یەکێك لەوانەی ئیمزای لەسەر ڕێککەوتننامەی (هلسنکی) کردووە وتوێژی کرد دەربارەی ئەگەری بەستنی کۆنگرەیەك لەنێوان ئەندامانی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك‌و ئەوانەی لەسەر ڕێککەوتننامەی (هلسنکی) ئیمزایان کردووە، ئەویش ڕەزامەندی نیشاندا لەسەر ئەنجامدانی کۆنگرەکە. پاشان پرۆفیسۆر (ئۆماڵی) ئەو بیرۆکەیەی گەیاندە (ڕزگار عەلی) سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك کە ئەویش لەلایەن خۆیەوە پشتیوانی دەربڕی‌و بۆچوونی وابوو کە ئەنجامدانی ئەم کۆنگرانە هەڵێکی باش دەبێت تاوەکو خەڵکی کەرکوك بیروبۆچوونیان بخەنەڕوو دەربارەی پرۆژە یاسای هەڵبژاردنەکان‌و ئەمەش دەبێتە ئاسانکارییەك بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکانی (١٦)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠١٠)، هەروەك (ڕزگار عەلی) دەستپێشخەرییەکەی پرۆفیسۆر (ئۆماڵی) خستە بەردەمی (جەلال تالەبانی) سەرۆکی کۆماری عێراق‌و ئەویش هاوڕابوو لەسەر ئەوەی کە (هلسنکی)و ئەم کۆنگرەیە ڕێگایەکە بەرەو گفتوگۆ لە بارەی کەرکوك‌و پرۆسەیەکی سەرکەوتوو دەبێت بۆ تاووتوێکردنی کێشەی کەرکوك بە ڕوونی لەنێوان سەرکردە نیشتمانییەکان‌و نوێنەرانی کەرکوك"[1].

* سەرچاوە:-

- ڕۆژنامەی (ئاسۆ)، ژمارە (١١٠٣)، لە (٢٢) تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٩)، لاپەڕە (٩).

*** دیمستۆراو پێشنیاری چارەسەرکردنی ناوچە کێشە لەسەرەکان:**

لە (٥)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٨)دا نێردراوی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە عێراق (ستیڤان دیمستۆرا) کۆمەڵێك پێشنیاری خستەروو دەربارەی چارەسەرکردنی ناوچە کێشە لەسەرەکان، لە سەرەتادا کورد پێشوازی لە پێشنیارەکانی کرد بەڵام کاتێك قۆناغی یەکەمی بڵاوکرایەوە بە نەرێنی پێشوازی لێ کرا، هەر یەکە لە تورکمان و عەرەبیش لە سەرەتادا لە دژی بوون، بەڵام لە دواییدا پێشوازییان لە پێشنیارەکانی کرد، چونکە لەو باوەڕەدا بوون ئەوەی کە نێردراوی نەتەوە یەکگرتووەکان پشتی پێ بەستبوو لە رووی ئامارەکانی هەڵبژاردنەوە دەستکارییەکی زۆر کرابوو لەلایەن کوردەوە بۆ هەڵبژاردن.

بنەماکانی ئەم پرۆژەیەی (دیمستۆرا) لەسەر سێ کۆڵەکەی گرنگ دارێژرا بوو، لە یەکەم کاردا وازهێنا بوو لە پرۆسەی راپرسی کە هاوپەیوەستی ماددەی (١٤٠) بوو لە دەستووری عێراقی، هەوڵدان بۆ سێ چارەسەر لە جێگەی ئەو ماددە دەستوورییە، ئەویش لە دیاریکردنی سروشتی نەتەوەیی دانیشتووانی ناوچەی کێشە لەسەرەکان، چارەسەری یەکەم بۆ ئەم کێشەیە پشتبەستن بە دەرهاویشتەکانی ئەو هەڵبژاردنەی کە لە ساڵی (٢٠٠٥)دا کراوە، لە دووەمەدا پشت بەستن بە ئاماری هەڵبژاردنی دانیشتووانی ساڵی (١٩٥٧)، سێیەمیش دووبارە پێداچوونەوەی ئەو بریارانەی کە لەلایەن سەرکردایەتی حیزبی بەعسەوە دەرچووە دەربارەی ناوچە کێشە لەسەرەکان لەسەر مەسەلەی دابەشکردنی زەوی کشتوکاڵی بۆ دانیشتووانی عەرەبە هاتووەکان بۆ کەرکوك.

پرۆژەی (دیمستۆرا) ناوچە کێشە لەسەرەکانی دابەش کردبوو بەسەر دوو بەشەوە یان بە دوو پۆلینەوە:

**١. ناوچە سادەکان:**

ئەمە هەموو ئەو شارو دێو گوندانە دەگرێتەوە کە رێژەی لیستی هەڵبژاردنە نەتەوەییەکانی لە (٧٠٪)یە، لە دواییدا ئەو ناوچانەی کە رێژەی نەتەوەیی هەڵبژاردنیان کەمتر لە (٣٠٪ - ٤٠٪)ە، لە باری یەکەمدا دەتوانرێت قەزای وەکو (خانەقین) لە پارێزگای (دیالە)و (مەخمور) لە خوارووی (هەولێر)و (خورماتوو) لە (کەرکوك)و (سنجار) لە سەرووی رۆژئاوای (موسڵ)و (شێخان) لە رۆژهەڵاتی (موسڵ) بگەرێندرێتەوە بۆ سەر یەکە کارگێرییەکانی هەرێمی کوردستانی عێراق، چونکە لەبەر ئەوەی لیستی کوردستانی لەم ناوچانەدا رێژەی هەڵبژاردنی کورد تێیدا لە (٧٠٪)ی تێپەڕاندووە، بەڵام ئەو ناوچانەی وەکو قەزای (مەندەلی)و قەزای (بەدرە) لە دیالەو ناحیەی (زاب)و (رەشاد) لە کەرکوك لەبەر ئەوەی کەمتر لە (٣٠٪)یان بەدەست هێناوە پێویستە لە رووی کارگێڕییەوە بخرێنە سەر حکومەتی ناوەندی.

**٢. ناوچە دژوارەکان:**

بریتییە لەو ناوچانەی کە بردنەوەی لیستی هەڵبژاردنی تورکمان و کوردو عەرەب بە رێژەی (٣٠٪ - ٧٠٪)ە، وا پێشنیاری کردووە کە ئەم ناوچانە دوابخرێت تا کۆتایی هەمان ساڵ، ئەگەر هاتوو ماددەی (١٤٠) لەم ناوچانە بۆ ماوەی شەش مانگ درێژ بکرێتەوە لە دوای کۆتایی هاتن لە چارەسەرکردنی ناوچە سادەکان، لیستی کوردی لە شاری کەرکوك بە رێژەی (٦٣٪) دەنگی بەدەست هێناوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە جێبەجێ کردنی مادەی (١٤٠) دوا دەخرێت بۆ دوو مانگی تر تا بۆ ئەوەی (دیمستۆرا) هەڵسێت بە گەلێك بیرکردنەوەو لێکتێگەیشتن تا بۆ ئەوەی هەموو لایەك رەزامەند بن.



*** میکانیزمی پرۆژەی (دیمستۆرا):**

ئەم پرۆژەیە دابەش کراوەتەوە سەر سێ قۆناغ بۆ چارسەرکردنی کێشەکانی و ئەو ناوچانەی کە کێشە لەسەرن:

**قۆناغی یەکەم:**

تایبەتە بەو چوار قەزایانەی کە نێردەی نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵیبژاردووە بەمەبەستی شرۆڤەکردنی سەرەتایی، مەبەستی نێردەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە دیاری کردنی ئەم بەشانەدا بۆ ئەوەیە تا بتوانێت پێشکەوتنێکی بابەتی هەمەلایانەی لەسەر دابڕێژێت تا بۆ ئەوەی لەسەر ناوچەکانی تری کێشە لەسەر بە کاری بهێنێت، لە هەمان کاتەدا بیخاتە بەردەم حکومەتی عێراقی بۆ چاوخشاندن پێیدا، وەکو قەزای (عەقرە، عەمادیە، مەخموور) لە پارێزگای نەینەواو ناحیەی (مەندلی) و قەزای (بەلەدروز) لە پارێزگای دیالە.

**قۆناغی دووەم:**

نێردەی نەتەوە یەکگرتووەکان بەردەوام دەبێت لە یارمەتی عێراق بۆ چارەسەرکردنی کۆمەڵێك لە قەزاکانی تری کێشە لەسەر لە سەرووی عێراق کە بریتییە لە قەزای (تەلعفەر، تلکێف، شێخان، سنجار) لە پارێزگای نەینەواو قەزای (خانەقین) لە پارێزگای دیالە.

**قۆناغی سێیەم:**

بریتییە لە پارێزگای کەرکوك و هەندێك قەزای هاوسنوور لێی کە لە رووی کارگێڕییەوە سەر بە پارێزگاکانی هاوسنوورێتی.

لە پاڵ ئەمانەدا زۆرێك لە سیاسییەکانی عێراق و شارەزایان لەو باوەڕەدان کە جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە لەم کاتەی عێراقدا زۆر بە زەحمەت دەکەوێت، پێویستە ئەم چارەسەرە لەلایەن عێراقییەکان خۆیەوە بێت و چارەسەری لەم سەردەمەدا زۆر زووە، ئەویش بە هۆی پێویستی کارکردنی بۆ کۆتایی هێنان بە گۆڕانکارییەکانی دەستوور کە لیژنەیەکی پەرلەمانی کاری تێدا دەکەن، هەندێك لە برگەکانی پێویستە لەلایەن هێزە سیاسییەکانەوە بڕیاری لەسەر بدرێت.

*** بۆچوونی کوردو تورکمان و عەرەب دەربارەی پرۆژەکە:**

کورد لەو باوەڕەدایە کە ئەم پرۆژەیە وای لێ دەکات کە هەندێك ناوچەی بەدەست بکەوێتەوەو بیخاتەوە سەر کوردستان، کورد سوپاسی (دیمستۆرا) دەکات لە چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك و ناوچە کێشە لەسەرەکانی، بەڵام ئەم نێردراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان پشت دەبەستێت بەم کارەی بۆ چارەسەرکردنی کێشە ئاڵۆزەکان لەسەر بڕیاری (١٧٧٠) کە لە ئابی ساڵی (٢٠٠٧) دەرچووە لە ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی کە لە بەندی سێیەمی برگەی دوودا گەلێك کاریایی پێویستی کردووە بۆ ئەوەی حکومەتی عێراق هەڵسێت بە چارەسەکردنی سنوورە ناوخۆییەکان کە کێشەی لەسەرە.

بەڵام تورکمان و عەرەبەکان ئەم پرۆژەیەی (دیمستۆرا) یان ڕەت کردەوە لەبەر ئەوەی هەڵبژاردنی ساڵی (٢٠٠٥) بە هەموو جۆرێك سەختەکاری تێیدا کراوە، پێویستە لەسەر نەتەوە یەکگرتووەکان بۆچوونی هەموو هێزە سیاسییەکان وەربگرێت لەسەر دۆسیێی ناوچە کێشە لەسەرەکان لە عێراق، لە هەمان کاتدا ئەم چالاکییەی کە نەتەوە یەکگرتووەکان پێی هەڵساوە لە عێراق کارێکی نایاساییە بە هەموو برگەکانییەوە، لە هەمان کاتدا پێویستە هەموو ئەم هێزانە هەوڵ بدەن بۆ ڕێکخستنی تۆماری تازەی هەڵبژێردراوەکان لە کەرکوك کە لەسەر بنەمای تۆماری ساڵی (١٩٥٧) بێت و ڕێگەی هەڵبژاردن لەسەر بنەمای کاری ئەلیکترۆنی بێت تا بۆ ئەوەی سەختەکاری تێیدا نەکرێت وەکو ئەوەی ساڵی (٢٠٠٥).

بۆچوونی عەرەب دەربارەی ڕەتکردنەوەی ئەم پرۆژەیە لەوەدایە کە گوایە هەندێك لەو ناوچانە تووشی ناحەقی دەبێت، بۆ نموونە قەزای (مەخمور) کە لەنێوان سنووری (موسڵ، هەولێر، کەرکوك)دایە کە پێکهاتووە لە ناحیەی (قەراج) زۆربەی دانیشتووانەکەی عەرەبن جیا دەکرێتەوە لە قەزای (مەخمور)، دەربارەی کەرکوکیش دەبێتە دابرانی قەزای (حەویجە) و ناحیەی (ڕەشاد، زاب، عەباسی، ڕیاز) و قەزای (داقوق، دوبز) لە شارەکەو لکانەوەی بەشەکانی تر بە کوردستان.

*** بنەڕەتی کێشەکە دەستوورە:**

دەستووری عێراقی کە لە ساڵی (٢٠٠٥)دا بڕیاری لەسەر دراوە زۆربەی هێزە سیاسییەکانی عێراق هەوڵ دەدەن بە دووبارە گۆڕانکاری تێدا بۆ چارەسەرکردنی هەندێك کێشەی هەڵپەسراو کە تایبەتە بە دەوڵەتی عێراقەوە، لیژنەی چارەسەرکردنی دەستوور کە پێکهاتبوو لە (٣١) ئەندام لە (١٥)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٦) دەستی بەکارەکانی کرد بەڵام نەیتوانی هیچ کێشەیەك لە کارەکان چارەسەر بکات تا بۆ ئەوەی دەستووری پێ بگوردرێت لە گەلێك یاسای گرنگ گرنگ تا بۆ ئەوەی هەندێکی لە پەرلەمانی عێراق لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت وەکو یاسای نەوت و غازو هەڵبژاردنەکان.

ئەوەی زیاتر کێشەکەی گەورە کردەوە نزیکەی (١٠٠) ئەندامی پەرلەمان یاداشتێکیان بەرز کردەوە دژی پرۆژەکەی (دیمستۆرا)، لە دوای چەند ڕۆژێك (١١٥) ئەندام داوای دابەشکردنی کەرکوکیان کردبوو بۆ چوار بنکەی هەڵبژاردن بە ڕێژەی (٣٢٪) بۆ هەر نەتەوەیەکی کوردو عەرەب و تورکمان و (٤٪) بۆ کلدوئاشووری.

دەربارەی کەرکوکیش نەیانتوانی مادەی (١٤٠) چارەسەر بکەن لە دەستووری عێراق لە ڕێگای ئاسایی کردنەوەو ئاماری دانیشتووان و هەڵبژاردن، بۆیە کێشەکان لە چوارچێوەیەکی داخراودا مایەوە کە زۆربەی ئەم کێشانەش خۆی دەبینێتەوە لە چوارچێوەی دەستوور.

*** ڕەوتە شیعیەکان‌و کێشەی کەرکوك:**

"بەشێوەیەکی گشتی ڕەوت‌و کەسایەتییە کاریگەرەکانی شیعە هەڵوێستێکی نەگەتیڤانەو پڕ ئاڵوزو دژە کۆکیان دەرهەق بە مافە زەوت کراوەکانی کوردستانیان لە کەرکوك هەیە.

لە لایەکەوە لە دوای ڕووخانی ڕژێمی سەددام، نزیك لە سەرجەم لایەنە شیعیەکان (مەقەلیدەکانی هەردوو مەرجەع) دژایەتی خۆیان لە دژی گەڕانەوەی کەرکوك بۆ سەر هەرێمی کوردستان دەربڕیووە. بۆ نموونە لە (١٢)ی تەمووزی ساڵی (٢٠٠٤) ئایەتوڵڵا عەلی سیستانی داخوازی وەفدێکی یەکێتی زانایانی ئاینی کوردستانی ڕەت کردەوە. وەفدەکە کە بە نوێنەرایەتی (١٢٩٢) ئەندامی ئەو یەکێتییە سەردانی سیستانیان کردبوو داوایان لێ کرد کە فەتوایەك دەربکات دەرهەق بە گێڕانەوەی موڵك‌و ماڵی داگیرکراوی کوردانی کەرکوك. ئایەتوڵڵا سیستانی نەك هەر داوکەی ئەوانی ڕەت کردەوە، بەپێچەوانەوە لە (١٩)ی ئابی ساڵی (٢٠٠٥) فەتوایەکی دەرکردو ڕایگەیاند کە "ڕێگا نادات کەرکوك بگەڕێتەوە سەر کوردستان" لەبەر ئەوەی بە وتەی ئەو (کەرکوك هی هەموو عێراقییەکانە)، هاوکات لەگەڵ ئەم فەتوایەی سیستانی دا، عەممار ئەلحەکیم (کە لە دوای باوکی، واتە عەبدولعەزیز ئەلحەکیم، بە دووەم کەسایەتی ناو ئەنجومەنی باڵای ئیسلامی دادەنرێت) لە دوو بۆنەی جیاوازدا یەکەمیان لە ئادارو دووەمیشیان لە حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٥)دا ڕایگەیاند کە کەرکوك عێراقێکی بچووك کراوەیەو هی هەموو عێراقییەکانە، بە ڕاشکاوی دژایەتی خۆی بۆ گێڕانەوەی کەرکوك بۆ سەر هەرێمی کوردستان دەربری.

"عەممار ئەلحەکیم لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط)دا بەم شێوەیە باس لە کێشەی کەرکوك دەکا:

ئێمە بە هیچ جۆرێك ڕازی نابین بە لکاندنی کەرکوك بەو پارێزگایانە یان بە هەر پارێزگایەکی تر، چونکە کەرکوك عێراقێکی بچووك کراوەیە..، هەروەها ئێمە بەرپەچی هەموو ڕاگواستنێکی زۆرەملێ دەکەین بۆ هەر عێراقییەك لە نێو هەر شارێکی عێراقیدا، چونکە هەموو عێراقییەکان ماف ئەوەیان هەیە لەهەر شێوێنێکی عێراقدا بژین".

بەپێی سایتی (ئەلمومەهیدون) کە لەلایەن ڕەوتی سەدرەوە سەرپەرشتی دەکرێت، ڕابەرانی حیزبی دەعوە بەر هەڵستکاری خۆیان بۆ باڵادەستی کورد لە کەرکوك دەربریوەو داکۆکیان لەوە کردووە کە نابێت کەرکوك لەلایەن هیچ گرووپێکەوە کۆنترۆڵ بکرێت‌و دەبێت بە شاری هەموو عێراقییەکان دابنرێت.

هەڵوێستی پارتی (فەزیلە) لە قاڵبی فەتوایەکی ڕابەری ڕۆحی پارتەکە، ئایەتوڵڵا محەمەد ئەلیەعقوبیی دا هات. ئەلیەعقوبی لە فەتواکەیدا دەڵێت داواکاری کورد بێ بناغەیەو هیچ بنەمایەکی مێژوویی‌و دیموگرافی‌و جوگرافی نییە. ئەم فەتوایەی ئەلیەعقوبی بێجگە لەوەی کوردی تێدا بە دەستدرێژی کەرو تاوانبار لە قەڵەم داوە، لە هەمان کاتیشدا ناوەڕۆکێکی هەڕەشە ئامێزیشی هەیەو داوای دامەزراندنی بەرەیەکی (شیعی - سوننی - تورکمانی) دەکات لە دژی پێشێلکارییەکانی کورد لە کەرکوك. ئەم فەتوایەی ئەلیەعقوبی کۆمەڵێك پەرچە کردارو کاری توندی تیژی لە دژی بارەگاو نووسینگەکانی ناوەڕاست‌و باشووری شیعە نشین لێ کەوتەوە. ڕەوتی سەدریش بە شکڵێکی ڕادیکاڵانە دژایەتی خۆی بۆ گێڕانەوەی کەرکوك بۆ سەر هەرێمی کوردستان نیشان داوە. بۆ نموونە بێجگە لە ناردنی سەدان میلیشا بۆ کەرکوك، لە شوباتی ساڵی (٢٠٠٤)دا هەزاران لایەنگری سەدر لە دژی گەڕانەوەی کەرکوك بۆ سەر هەرێمی کوردستان خۆپیشاندانیان سازکرد. هەریەك لە حوسێن شەهرستانی وەزیری نەوت دیارترین کەسایەتی ناو گرووپی سەربەخۆکان لە ئیئتیلاف شیعی حیزبوڵڵای عێراقی یەکێکی تر لە پارتە شیعیەکانی ناو ئیئتیلاف بە شێوەی جۆراوجۆر نارەزایەتی خۆیان نیشان داوەو تەنانەت حیزبوڵڵا ڕایگەیاند کە مێژوو لەو لایەنانە خۆش نابێت کە ڕێگا بدەن کەرکوك بخرێتەوە سەر کوردستان.

لەلایەکی تریشەوە سەرەڕای ئەوەی کە باڵانسی هێز لە بەرژەوندی شیعەکان دا بووە کەچی مادەی (٥٨) لە دەستووری کاتی ومادەی (١٤٠) لە دەستووری هەمیشەیی عێراق دا چەسپێنراون‌و حکومەتی مالیکیش لە کارنامەی خۆیدا مادەی ٢٢ی تایبەت بە جێبەجێ کردنی ئەو دوو ماددەیە ڕاگەیاندووە.

بەدەر لە فاکتەرگەلێك لە بابەتی نارێکخراوەیی و کەم ئەزموونی شیعەکان لە دوو ساڵی یەکەمی دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس‌و بوونی ئەمەریکاو دەرگیری خوێناویانەی شیعەو سوننەو زیاتر ڕێکخراو بوونی هێزە کوردستانییەکان‌و ڕۆڵێك کە کوردستانییەکان دەتوانن بیگێڕن لە شەرعیەت پێدان‌و سەرپێ خستنی حوکمرانی شیعە لە عێراق دا، دەکرێت دابەشبوونی شیعەکان بە گوێرەی هەڵوێستیان لەسەر فیدرالیزم بە هۆکارێکی کاریگەر دابنرێت‌و بکرێتە بنەمایەك بۆ پۆلێن کردن‌و ناسینەوەی سیاسەتی شیعەکان دەرهەق بە کەرکوك‌و تێگەیشتن لە هەڵوێستە پارادۆکسیەکانیان. بۆ ئەوەی لەم هاوکێشەیە تێبگەین، پێویستمان بە وەیە کە لە سروشت‌و ناوەڕۆکی کێشەی کەرکوك تێ بگەین‌و ئەمەش یارمەتی دەرێك دەبێت بۆ چوونە ناو باسی هەڵوێستی ڕەوتە شیعیەکان لەمەڕ کێشەکە. خواستی کوردستانیان بەتەنها سنوور دار نییە بە نۆرماڵیزە کردنی بارودۆخی دەیان ساڵی شێوێنراوی کەرکوك (واتە نیشتەجێکردنەوەی ئاوارە کوردەکان‌و گێڕانەوەی عەرەبی هاوردە بۆ ئەو ناوچانەی کە لێیەوە هاتوون)، هەروەك لە ڕوانگەی کوردستانیانەوە کێشەکە بەوەش کۆتایی نایەت ئەگەر ئیدارەی کەرکوك لەلایەن کوردەکانی ئەو پارێزگایە بەڕێوە بچێت، بەڵکو بۆ کوردستانییەکانی ئەو ناوچەیە بەشێکی دانەبڕاوە لە کوردستان‌و پێویستە بگەڕێتەوە سەر هەرێمی کوردستان‌و لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە ئیدارە بکرێت. لێرەوە کێشەی

کەرکوك دەبێتە بەشێك یان هاوتای کێشەیەکی گەورە تر کە ئەویش مەسەلەی فیدرالیزمەو دەکرێت کە هەڵوێستی شیعەکان لە سەر کەرکوك بەگوێرەی هەڵوێستیان لەمەڕ فیدرالیزم پۆلێن بکرێت. بە مانایەکی تر هەروەك چۆن لەڕوانگەی ئەو ڕەوتو کەسایەتییە شیعیانەی کە نەیاری سیستەمی فیدراڵین، فیدرالیزم هۆکارێکە بۆ دابەش کردنی عێراقو زەوت کردنی مافی شیعە بۆ حوکمڕانی کردن بەسەر هەموو بەشەکانی ئەو وڵاتەدا، بەهەمان شێوەش گەڕانەوەی کەرکوك بۆ سەر هەرێمی کوردستان بە مانای بەڕەسمی ناسینو فراوان کردنو بە هێز کردنی ئەو هەرێمەو ڕێگە خۆش کردن بۆ جیابوونەوەی کوردستانو دابەشکردنی عێراقو بێ بەهرە کردنی ناوەند لە داهاتی نەوتی کەرکوك دێت.

بە پێچەوانەی لایەنگرانی سیستەمی ناوەندی (مەرکەزی)، ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی، کە خوازیاری دامەزراندنی هەرێمێکی فیدراڵییە بۆ شیعەکان کە مافی سوود وەرگرتنو بەکار هێنانی داهاتی نەوتی باشووری هەبێت (بڕی نەوتی باشوور چەند بەرابەری نەوتی کەرکوکە)، دەبێتە ئامانجێکی تازەی ئەو پارتە. لێرەوە دەکرێت کە لە بەشێك لەو مەتەڵە تێ بگەین کە بۆچی هەندێك لە شیعەکان چاوپۆشیان کرد لە جێ کردنەوەی مادەی (١٤٠) لە دەستووری عێراقی دا. ئەم ئاراستەیە لەسەر پێوەندی نێوان ئەنجومەنی باڵاو دوو پارتە سەرەکییەکەی کوردستان بەڕاشکاوی ڕەنگی داوەتەوەو بە جۆرێك کە باس لە ڕێکەوتنی ستراتیژی دەکرێت لەنێوان ئەو دوو لایەنەدا. بەواتایەکی تر مل دانی شیعەکان بە مادە (١٤٠)ی دەستووری هەمیشەییو بڕگەی (٢٢)ی کارنامەی حکومەتەکەی مالیکی تا ڕادەیەك دەرەنجامی ڕاستەوخۆی ئەو وەرچەرخانەیە کە لە بونیادی هزریو ستراتیژی ئەنجومەنی باڵا ڕووی دا (هەر وەك لە سەرەوە ڕوونم کردۆتەوە). سەرەنجام دەکرێت بگووترێت کە هێزە شیعییەکان تا زیاتر نەیاری فیدرالیزمو لایەنگری سیستەمێکی ناوەندی بەهێز بن لە بەغدا سەرسەختانەتر دژی گەڕانەوەی کەرکوکن بۆ کوردستان. ئەوانەش کە مەیلی بە فیدرالیزە کردنی عێراقیان هەیە زیاتر نەرمو نیانیو تێگەیشتن نیشان دەدەن لەم خواستەی کوردستانیان.

پێویستە ئەوە بخرێتە پێش چاو کە ئەم نەرمی نواندنەی لایەنگرانی فیدرالیزم لەمەڕ ماددەی (١٤٠) ناگاتە ئاستی دەست پێشخەری یان هەنگاونان بەرەو جێبەجێ کردنی ماددەکە. لەم سۆنگەوە جیاوازییەکی کەم هەیە لەنێوان هەردوو لایەنی شیعە (واتە یارو نەیاری فیدرالیزم، یان موقەلیدەکانی هەردوو مەرجەعەکە). ئەگەر لەو خاڵە بترازێین کە لایەنگرانی سیستەمی ناوەندی بەهێز ئیدارە کردنی ڕاستەخۆی کەرکوكو تەنانەت شارەکانی تری کوردستان بە مافێکی بێ ئەملاو ئەولای بەغدای دەزانن، کە ڕەنگە ئەوە بۆ ئەنجومەنی باڵا هێندە مەبەست نەبێت، ئەوا کۆمەڵێك فاکتەری هاوبەش هەیە کەوا دەکات هەردوو لایەن (ئەگەر بە ڕادەی جیاوازیش) بێت بەرهەڵستی جێ بەجێ کردنی مادەی (١٤٠) بکەن. بۆ نموونە ڕێژەیەکی بەرچاوی هاوردە عەرەبەکانی کەرکوك شیعەکانی ناوەڕاستو خوارووی عێراقنو زۆربەیان لایەنگرو هەواداری پارتە ئاینییەکانی شیعەن، بۆیە هەر پارتێکی سیاسی شیعە مل بدات بەجێ کردنی ئەو ماددەیە ئەوا بەرژەوندی دۆست ولایەنگرەکانی خۆی (هاوردەکانی کەرکوك) دەخاتە مەترسیو سەرەنجام پایەی جەماوەری خۆی دەکاتە قوربانی.

بەڵام گەورەترین بەربەست کەوەك یەك (بەڵام بە هۆکاری جیاوان) کار لە هەردوو ڕەوتە شیعییەکان دەکات بریتییە لە دژایەتی کردنی سەرسەختانەی سوننە بۆ گەڕانەوەی کەرکوك بۆ سەر کوردستان. وەك زانراوە کە زۆرینەی سامانە نەوتییەکانی عێراق لە باشووری شیعەنشینو لە کوردستانە (واتە کەرکوك)ە. ئەگەر کەرکوك بگەڕێتەوە سەر کوردستان ئەوا سوننەکان ناچار دەبن کە بەتەواوی ئیعتیماد بکەنە سەر نەوتی باشوورو زیاتر خۆیان بە باشوورەوە گرێ بدەنەوە. سەرەنجام لایەنگرانی هەرێمی فیدراڵی باشوور، کە خەون بە هەرێمێکی یەککگرتووی شیعە دەبینن کە خاوەنی سەروەتی نەوتی تایبەت بەخۆیان بن، پڕۆژەکەیان ڕووبەڕووی ڕێگریو بەرهەڵستکارییەکی بێ ئەندازەی سوننەکان دەبێتەوە.

بەهەمان شێوە، جێبەجێ کردنی مادەی (١٤٠) لەسەر حکومەتو حیزبەکەی مالیکیو ڕەوتە ناوەندی خوازەکانی تری شیعە زۆر کاریگەری نەگەتیڤانە بەجێ دێڵێت. هێشتنەوەی کەرکوك لە دەرەوەی دەسەڵاتی کوردستان یەکێکە لەو ئامانجە هاوبەشە کەمانەی کە ڕەوتە ناوەندیخوازەکانی شیعەو سوننە کۆ دەکاتەوە. بەمانایەکی تر لەو فەزا ئاڵۆزو جەنجاڵییەی نێوان شیعەو سوننەکانی عێراق دا دژایەتی کردنی خواستی کوردستانیان دەرهەق بە کەرکوك یەکێکە لەو ئامانجە هاوبەشانەی کە ڕەنگە ببێتە زەمینەیەك بۆ دروستکردنی بەرەیەکی هاوبەشوله یەکتری نزیك کردنەوەی نەیارانی مادەی (١٤٠)، کە ئەمەش بۆ ئەو پارتە شیعییەنەی کە خەون بە حوکمڕانی کردنی هەموو عێراقەوە دەبینو هەلێکی زێڕینە بۆ هاندانی سوننەکان بۆ ناو پرۆسەی سیاسیو سەرەنجام بۆ ئیحتیوا کردنی بەر هەڵستکاری سوننەکان بۆ حوکمی شیعە. لەبەر ئەوە ئیلتیزامی ئەلمالیکیو ڕەوتە دژە فیدراڵییەکانی تری شیعە بە مادەی (١٤٠)ی دەستوورەوە لە یەکەوە بە مانای سووتاندنی ئەو کارتە زێڕینە دێت، لە لایەکی تریشەوە، بە گەڕانەوەی کەرکوك بۆ سەر کوردستان، کوردستانییەکان ڕەنگە چیتر بەو گەرمییەی جاران کار بۆ بونیاد نانەوەی دەوڵەتی عێراقو شەرعیەت دان بە حوکمی شیعەو ناوبژیوانی سوننەو شیعەکان نەکەن. لێرەدا شیعەکان لەبەردەم دووڕیانێك دا خۆیان دەبیننەوە کە یەکەمیان فەرامۆش کردنی نارەزایەتی سوننەکان بێتو ئەو مادیە جێ بەجێ بکەن دووەمیشیان خۆ دزینەوەیە لە جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠).

شیعەکان کە تا ئێستا ئەم ڕێگایەیان پیادە کردووەو وا پێ دەچێت کە بارودۆخەکەش بەو ئاقارەدا بڕوات کە شیعەکان ڕاشکاوانەتر و بێ سڵەمینەوە لە نیمچە بەرەیەکی هاوبەش لە گەڵ سوننەکان کار بۆ فەرامۆش کردنی یەکجارەکی ئەو ماددەیەی دەستوور بکەن.

بەکورتی پارتە شیعییەکان پابەندو موقەلیدی مەرجەعەکانیانن. بەپێی تێکەڵاو بوونی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی مەرجەعەکان لە کاروباری سیاسی و حوکمڕانی دا دەکرێت کە مەرجەعەکانی شیعە بۆ مەرجەعی بەدەنگ بێدەنگ پۆلێن بکرێن. سرووشتی مەرجەعە بەدەنگەکان سروشتێکی ڕادیکاڵانەیە کە کار بۆ دامەزراندنی حوکمی ئیسلامی (شیعە) دەکات، کە دەکرێت لە قاڵبی حکومەتی فیقهی دابێت هەر وەك ئایەتوڵڵا محەمەد سادق ئەلسەدر بانگەشەی بۆ دەکرد یان لە قاڵبی حکومەتی ئیسلامی دابێت کە محەمەد باقر ئەلسەدر کاری بۆ دەکرد. بەشێوەیەکی گشتی لایەنگرانی مەرجەعەی بەدەنگ خەسلەتێکی نیشتیمانی (عێراقچی)یان هەیە واتە کار بۆ پیادەکردنی حوکمڕانی و سەپاندنی قەڵەمڕەویی خۆیان دەکەن بەسەر هەموو عێراق دا بە کوردستانیشەوە. بۆیە ئەو پارتانە دژی داخوازی و دەسکەوتەکانی گەلی کوردن، بەتایبەت خواستی فیدراڵی و کەرکوك.

هەرچی مەرجەعی بێدەنگیشە بەو پێیەی کە ڕاستەوخۆ تێکەڵ بەسیاسەت نابێت، لە لایەکەوە کار بۆ حوکمڕانی ڕاستەوخۆی مەرجەع (یان حکومەتی ئیسلامی بە تایبەت ویلایەتی فیقهی) ناکات، لە لایەکی تریشەوە بە تێکەڵ نەبوونی بە سیاسەت دەستی پارت و لایەنە موقەلیدەکانی ئاوەڵاتر دەکات. نمونەی ئەو مەرجەعەش مەرجەعی سیستانییەو یەکێك لە پارتە مەقەلیدەکانیشی ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامییە. ئەنجومەنی باڵای ئیسلامی لە پرۆسەیەکی مێژوویدا دەسبەرداری ئامانجی بەرقەرار کردنی حکومەتی ئیسلامی بووە، تێزی مەزلومیەتی شیعەی زەق کردەوە وئێستا کار بۆ دامەزراندنی هەرێمێکی شیعە دەکات لە باشووری عێراق دا. ئەم هەنگاوەی ئەنجومەن جۆرێك لە هاوسۆزی و هاوسەنگی بۆ کورد دروست کردووە، بەڵام باڵانسی هێز لە عێراق دا زیاتر بەلای سیستەمی ناوەندی دایە. بێجگە لەوەش، هەرچەند ئەنجومەنی باڵا نەرمنوێنی نیشان داوە دەرهەق بە کێشەی کەرکوك، بەڵام بەو ڕادەیە نییە کە بەرژەوندییەکانی خۆی لەپێناو داوکاری کورددا بخاتە ژێر پرسیارەوە.

بەتەتەڵە کردنی باسەکە دەکرێت بگووترێت کە لە عێراقی شیعەدا، شیعەکان هەر بەتەنها جێگرەوەی سوننەکان و میراتگری عێراقی سوننە نین، بەڵکو پارێزەرو پاسەوانی زۆرێك لەو حوکم و یاساو ڕێسایانانەن کە عێراقی سوننەی لەسەر بونیاد نرا بوو، بەتایبەت لەوانەی کە پەیوەستن بە فیدراڵیزم و کێشەی کەرکوك کە بە کرۆکی داخوازییەکانی گەلی کوردستان دادەنرێن. بۆیە گرێدانەوەی چارەنووسی کوردستان بە عێراقەوەو باوەڕ بوون بە دامەزراندنی سیستەمێکی فیدراڵی خەونی چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك لە ڕێگای گفتوگۆو چارەسەری عێراقییانە، مەلە کردنە لە ئاوی لێڵ دا، زیدەڕۆیی نابێت ئەگەر بگووترێت یەکێکە لە گەورەترین سەرکێشییەکانی سەرکردایەتی سیاسی کوردستان لە مێژووی جوڵانەوەی گەلی کوردستان دا"[1].

"ساڵی (٢٠٠٦) ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بەندەکانی پرۆژەی هەرێمەکانیان پەسەندکرد، کە لیستی ئیئتلافی شیعی پێشنیازی کردو لیستی هاوپەیمانانی کوردستان پشتیوانی کرد.

بە پێی پرۆژەکە ئەنجومەنی باڵای ئیسلامی عێراق بەم هەرێمانە دابەش دەکرێت:

هەرێمی ناوەڕاست: لە شارەکانی بابل، واست، موسەنا، دیوانیە، کەربەلاو نەجەف پێکدێت.

هەرێمی باشوور: لە بەسرە، ناسریەو میسان پێکدێت.

هەرێمی خۆرئاوا: لە شارەکانی ئەنبارو سەلاحەددین پێکدێت کە زۆرینەی دانیشتووانەکەی سوننین.

هەرێمی باکوور (هەرێمی کوردستان)، لە شارەکانی هەولێرو دهۆك و سلێمانی پێکدێت کە لە ساڵی (١٩٩١)ەوە دروستبووە.

پارێزگای موسڵ لەبەر ئەوەی کە نەتەوەو مەزهەب و دینی زۆری تێدایە، بە ناوچەی ململانێ ناسراوەو هەرچی پارێزگای کەرکوکیشە کە لە سێ نەتەوەی سەرەکی کورد، عەرەب و تورکمان پێکدێت، وەك ناوچەیەکی ناکۆکی لەسەر ماوەتەوەو کورد دەیەوێت بیخاتەوەسەر هەرێمی کوردستان و عەرەب و تورکمانیش نارازین.

شاری بەغداش وەك هەرێمێکی سەربەخۆ دەمێنێتەوەو داوای ئەوەش هەیە کەرکوکیش بکرێتە هەرێمێکی سەربەخۆ"[2].

"دکتۆر عادل عەبدولمەهدی جێگری سەرۆك کۆماری عێراق (لە ساڵی ٢٠٠٩)، لە دوو دیداری ماوە جیاوازدا بیروڕای جیاوازی خستەڕوو دەربارەی کەرکوك، بەڵام جێی مشتومڕی جیاواز جیاواز بوو، لە یەکەمیاندا ووتی لە چارەسەری کەرکوکدا نابێ تەنیا دیلی مێژووی بین و لە هی دووەمیاندا ووتی: هەندێك تەنگژەی عێراق، لەوانە تەنگژەی کەرکوك، نیشانەی تەنگژە نییە، بەڵکو وورده وورده دۆخی وڵات باش دەبێ و پێویستە دەست بۆ دۆسێ گەرمە هەڵپەسێردراوکان ببەین.

عەبدولمەهدی پێیوایە هەر چارەسەرێك بۆ کەرکوك مافی لایەنێك فەرامۆش بکات، ئەو چارەسەرە درێژە ناکێشێ. لە دوو دیداری ئەم دواییەشدا پێشنیازی نموونەی (ئەندۆرا) ی کرد، (ئەندۆرا)(*) ئیمارەتێکی هاوبەشە لەنێوان فەرەنساو ئیسپانیا، لەناو خاکی فەرەنسایە، بەڵام سەرۆکی فەرەنساو حاکمی ئاییینی هەرێمی ئیسپانیا لە سەرووی حاکمی ئیمارەتەکەوە بەرپرسن.

لەم نموونەیەدا عەبدولمەهدی وەك ئەمریکاییەکانی کرد کە داوای دوورکەوتنەوە لە مێژوو دەکات، بەڵام زۆری پێناچێ خۆشی هەر مێژوو تەوزیف دەکاتەوە، ئەمەشیان خۆی لە خۆیدا کارێکی سەلبی نییە مادام خاوەنەکەی هاندەدات بیربکاتەوە.

ڕەنگە عەبدولمەهدی تاقە عەرەبی عێراقی بێت کە لە رووی فیکرییەوە خۆی بۆ کەرکوك ماندوو دەکات و دەیەوێت بیروڕایەکی عێراقییانە بڵێت کە تا ئێستا جیاواز لە کورد عێراقییەکانی تر زۆر خەمیان نەبووە بیر لە مەسەلەی کەرکوك بکەنەوە. وەك سەرکردەیەکی شیعە دکتۆر عادل

عەبدولمەهدی زۆر کارەکتەری دیکەی شیعەی تێپەڕاندووە، لەوانەش دکتۆر جەعفەریو نوری مالیکی دوو سەرۆك وەزیرانی لە سەرییەك کە بیروڕای زۆر کرچوکاڵیان لەسەر کەرکوك هەیەو بەلای عروبەییەکی سادەو ساکاردا دای دەشکێنن.

دکتۆر عەبدولمەهدی لە بیرکردنەوەی کەرکوکدا بە دوو ئاراستە دەڕوات: ئاراستەیەکی هەستی کوردستانیی دەبزوێنێت کاتێك تێگەیشتنی خۆی بۆ داوای مێژوویی لە کەرکوکێکی کوردستانیدا ڕەچاو دەکاتو لە هەمانکاتدا خەمە عەرەبییەکانو خولیای دەوڵەتداریی عێراقیش ڕەچاو دەکات.

بۆیە دەڵێ: دەکرێ بەشێك بێت لە کوردستان بەڵام قەوارەیەکی تایبەتی هەبێو حکومەتی ئیتحادیش بەشدار بێت لە ئیدارەدانی، لێرەدا نموونەی (ئەندۆرا) دەگێڕێتەوە. عەبدولمەهدی ماوەیەکی زۆر لە فەرەنسا ژیاوەو خراپ نییە کە دیتنو خوێندنەوەکانی خۆی وەك بیرمەندێكو کارەکتەرێکی سیاسی لە مەنفای فەرەنسا ژیاو لە پرسە عێراقییە ئاڵۆزەکاندا بیری بخاتە کار، بە تایبەتی کە ماشەڵڵای لێبێت ئەدەبیاتی سیاسیی عێراق لە خوێندنەوەی ڕەهەندە جیاجیاکانی تەنگەژە عێراقییەکاندا زۆر هەژارو بەلەنگازە"[٣].

*** سەرچاوە و پەراوێزەکان:-**

١. (سیاسەتی شیعەکان دەرهەق بە کەرکوكو فیدراڵی)، ئارام ڕەفعەت، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٩، لاپەڕە (٤٩ - ٥٨). هەروەها بۆ زیاتر بڕوانە:

ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط)، ژمارە (٩٦٨٨)، لە (٧)ی حوزەیرانی ساڵی ٢٠٠٥.

٢. ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)، ژمارە (٣٧١)، (٢٥)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٨)، لاپەڕە (٥).

*. ئەندۆرا ئیمارەتێکی لەسەر سنوور، دەوڵەتێکە بە بێ سوپا، حەوت سەدەیە جەنگی نەدیوە دروشمی دیار پێکەوە ژیانی گەلە جیاوازەکانە، دەسەڵاتی میری وڵات تەنها رووکەشەو ئەندۆرییەکان خۆیان حکومەتی خۆیان دەکەن. ئەویٚ دەوڵەتە شارێکە جیاواز لە سیستەمەکانی تر نزیك لە خەونەکەی ئەفلاتۆن.

ئیمارەتەکە دەکەوێتە ناوچەیەکی شاخاوییەوە لە ڕۆژهەڵاتی زنجیرە چیای برانس ڕێژەی بەرزییەکەی دەکاتە (١٩٩٦) مەتر، بەرزترین لووتکەشی (٢٩٤٦) مەترە.

ڕووباری (فالیرا) لە ئەندۆرادا تێپەڕ دەبێت. کەشی ئەندۆرا بە شێوەیەکی گشتی سروشتییە، شتێکی ئاسایی، بە نیسبەت وڵاتانی دراوسێیەوە، کەشەکەی ساردترەو بەفربارینیش زیاترە.

لە ئەندۆرا ئەندۆرییەکان زۆرینە نین بەڵکو ئیسپانییەکان زۆرینە پێك دەهێنن بە ڕێژەی (٤٣٪)، ئەندۆرییەکانیش (٣٣٪) پورتوگالییەکان (١١٪)، فەرەنسییەکانیش (٧٪) زمانی ڕەسمی ئەندۆرا کاتالانیەو ئاینی زۆرینەش مەسیحیەتی کاسۆلیکییە. گەورەترین شاری وڵاتی ئەندۆرا لافیلایە کە ڕێژەی دانیشتووانەکەی (٢٠,٤٣٧) کەسە.

گەشتوگوزار بنەمای سەرەکییە لە ئابووری وڵاتو (٨٠٪) ئابووری وڵاتی لەسەرەو ساڵانە (٩) ملیۆن گەشتیار رووی تێدەکەن. کەرتی بانکی وڵاتیش هۆکارێکە بۆ ڕاکێشانی سوودمەندان لە وڵاتانی ترەوە بە هۆی کەمی باجەوە.

زۆربەی بەروبوومە کشتوکاڵییەکانیش لە دەرەوە دەهێنرێن، بە هۆی سەختی جوگرافیای ناوچەکەوە کە کشتوکاڵی لێناکرێت، هەندێك کشتیاری تایبەت نەبێت. ئاژەڵداریی و چاندانی تووتن کاری سەرەکی بەشێك لە ئەندۆرییەکانەو پارەی بەکارهێنراویش یۆرۆیە.

ئەندۆرا نە خاوەنی فرۆکەخانەی نێودەوڵەتییەو نە هێڵی شەمەندەفەریشی هەیە، بەڵام بە چەند ڕێگایەکی دەبەسترێتەوە بە فەرەنساو ئیسپانیاوە.

ئەندۆرا دواهەمین ئیمارەتە لەو ئیماراتەنەی (شارلمان) پاشای فەرنسا (٧٤٧ - ٨١٤) دایمەزراند بۆ ئەوەی ببێتە بەربەستێك لەنێوان فەرەنساو موسڵمانەکاندا کە ئەوکات حوکمی (ئەندەلوس)یان دەکرد (هەرێمێکە لە ئیسپانیا).

لە ساڵی (١٢٧٨)ەوە تاوەکو ساڵی (١٩٩٣) ئیمارەتەکە بە هاوبەشی لەنێوان سەرۆکی ئیمارەتەکە کە فەرەنسی بوو لەگەڵ ئەسقەفی کڵێسەکەدا کە ئیسپانی بووە بەڕێوەدەبرا.

لە ساڵی (١٩٩٣)ەوە ئەم فەرمانڕەوایەتییە فیوداڵییە گۆڕدرا بۆ دەوڵەتێکی پاشایەتی، پەرلەمانی دیموکراتی، ئیمارەکە لەلایەن دوو ئەمیرەوە بەڕێوەدەبرێت کە دەسەڵاتی جێبەجێکردنیان نییە، دەسەڵاتەکەیان لەلای سەرۆك وەزیرانە کە دەسەڵاتی جێبەجێکردنی بەدەستە. پەرلەمانی ئەندۆرا لە (٢٨) کەس پێك دێت کە نیوەیان لە دەنگدانی گشتیدا هەڵدەبژێردرێن، ئەوانی تریش لە هەر حەوت شارەوانییەکەی وڵاتەوە دێن.

سیستەمی سیاسی لە پاش پشتبەستن بە دەستوورەوە لە ساڵی (١٩٩٣) پێناسەیەکی نوێو دابەشکردنێکی تازەی بەخشی بە پۆستە سیاسییەکان. سیستمی سیاسی پەرلەمانی دیموکراتییە میری وڵات سەرۆکایەتی دەکات. بەڵام بەشێوەیەکی پراکتیکی سەرۆکی حکومەت کارەکان دەبات بەڕێوە. دوو کەس پلەی میریان هەیە، یەکەم: سەرۆك کۆماری فەرەنسا. دووەمیش مەترانی کڵێسای کاسۆلیك، شارێکی ئیسپانی بەو شێوەیەش سیستەمی حوکم لە ئەندۆرا بێ وێنەیە لە جیهاندا، لەبەر ئەوەی ئەندۆرا سوپای نییەو قورسایی سیاسیشی نییە هەر یەکە لە فەرەنساو ئیسپانیا بەرگری لە ئەندۆرا دەکەن. ئەندۆرا بەسەر حەوت شارەوانیدا دابەش کراوە کە لە (Parroquies) ناسراون.

ئەندۆرا کەشوهەوایەکی چوون کوردستانی هەیە چیای بەرزو سەوزایی و هەوای فێنكو بەفری زستان، جودا لەوانەی کە لە هەردوو کەرتی گەشتیاریو بانکیدا کاردەکەن، وەکو ئاماژەمان بۆ کرد بەشێکی ئەندۆرییەکان بە ئاژەڵدارییەوە خەریکن، بۆیە بەیانیان گوێت لە زەنگۆڵەی ملی ئاژەڵانو هاواری شوانەکان دەبێت کە بەرەو دۆڵو شیوەکان دەیانبەن. ئەوەی سەرنجراکێشە لەو مەسەلەیەدا بە تەمەنی شوانەکانیانە کە زۆربەیان لە سەرووی (٥٠) ساڵیەوەن، بە پێی ڕاپۆرتێکی

ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی ناوەندی تەمەن لە ئەندۆرا (٨٣,٥) ساڵە کە ئەمەش ڕێژەیەکی زۆر بەرزە ئەگەر بەراوورد بکرێت لەگەڵ هەر وڵاتێکی تری جیهاندا. لەگەڵ ئەوەشدا جگەرەو کحولیات لە ئەندۆرا زۆر هەرزانترە بە بەراورد بە وڵاتەکانی تری جیهان، چونکە جگەرەو کحولیات گومرگیان ناچێتە سەر تەنانەت لە کافیتریای نەخۆشخانەکانیشیاندا شەرابی سوور پێشکەش دەکرێت.
بەڵام ئەندۆرییەکان زۆر گرنگی بە ڕەوشی تەندروستیان دەدەن و وەرزشیش زۆر دەکەن، ئەندۆرا کە ژمارەی دانیشتووانەکەی (٨٣) هەزار کەسە، (٧) سەنتەری تەندروستی گشتی لە خۆدەگرێت لەگەڵ چەندین سەنتەری تەندروستی تایبەتدا. زیاد لەمانەش چەندین سەنتەری ئیرۆبیکسی ئاوی بە خۆرایی بۆ ژنە بە تەمەنەکان هەیە.
هەروەك یەکێکی تر لە هۆکارەکانی تەمەن درێژییان بێگەردی کەشوهەوایە بە هۆی نەبوونی ئەو کارگانەی ژینگە پیس دەکەن. جودا لەوەش گرنگی دانیانە بە خۆراك کە ژەمەکانی خواردن لە چێشتخانەکاندا سادەو تەندروستن کە پشت بە گۆشتی سوور بە بێ چەوری و میوەو سەوزەمەنی و زەیتی زەیتون و شتی لەو جۆرە دەبەستن کە هەموویان باشن بۆ دڵ.
ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی لە ڕیزبەندی سەرپەرشتی تەندروستیدا ئەندۆرای بە سێیەم ئەژمارەکردووە لە جیهاندا، نەخۆشخانەکانی ئەندۆرا هەر چەندە بە خۆراین، بەڵام کەشێکی تایبەتی تێدا بەدی دەکرێت لە سەرپەرشتی تەندروستی دا.
لە گرنگییەکانی ئەم ئیمارەتە شاخاوییەی نێوان فەرەنسا و ئیسپانیا ئەوەیە خاوەنی ئاڵاو نوێنەری دەرەکی و هەڵبژاردەی تۆپی پێیە کە شانبەشانی باشترین هەڵبژاردەکانی ئەوروپا کێبڕکێی سەرکەوتن بۆ جامی جیهانی دەکات.
جوانی سروشت و کەش و هەواکەیشی، وایکردووە ببێتە هۆی ڕاکێشانی گەشیاران کە یارمەتی داهاتی گشتی دەدات. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا جوانی ژیان و پێکەوە بوون لە گرنگترین سیماکانی ئەندۆرییەکانە کە گەلانی ئەندۆرا بە جیاوازی ئینتما نەتەوەییەکانیانەوە پێکەوە دەژین و ئەندۆرییەکی ئەسڵی بە گیانی پێکەوە ژیانەوە لەگەڵ فەرەنسییەك یان ئیسپانییەکدا کاردەکات و بۆ داهاتوو دەڕوانێت.
ژیان لە ئەندۆرا بە سادەیی دەڕوات و خۆشگوزەرانی ئاستی تاوانیشی نەهێشتووە، ڕێژەی تاوان لە ئەندۆرا (٠٪)ەوە، وڵاتی ئەندۆرا تەنها یەك زیندانی تێدایە کە ئەویش جێگەی تەنیا (٥٠) کەسی تێدا دەبێتەوە.
ئەندۆرا سوپای نییەو حەوت سەدەیشە جەنگی بە خۆیەوە نەدیوە، بۆیە خەڵکی ئەندۆرا هەست بە مورتاحی دەکەن و ئەوەش فاکتەرێکی یاریدەدەرە بۆ جوانترکردنی ژیان. ژیان لەوێ سادەیە، جوانە، نموونەییە، بۆیە دەوترێت ئەندۆرا خەونەکەی ئەفلاتۆنە بۆ دەوڵەتە شار[4].

(٣) گۆڤاری (هەفتانە)، ژمارە (٢٤)، کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٩)، لاپەڕە (١٠ – ١١).
(٤) گۆڤاری (هەفتانە)، ژمارە (٢٤)، کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٩)، لاپەڕە (٤٢ – ٤٥).



*** راوبۆچوونی فەلەکەدین کاکەیی دەربارەی چارەسەری کێشەی کەرکوك:**

"وەزیری پێشووی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان لە چاوپێکەوتنی لەگەڵ رۆژنامەی (المدی البغدادية)دا بەم شێوەیە ئاماژە بە چارەسەری کێشەی کەرکوك دەکات: جیهان لە گۆراندایە، پێویستە لەسەرمان پاداگری بکەین لەسەر ئاشتەوایی نیشتمانی کە وای ئەبینم بەشێکە لە چارەسەر کێشەی کەرکوك، من ئەپرسم ئەگەر بێت و کەرکوك لەژێر کۆنترۆڵی کورد یا تورکمان یا عەرەبدا بێت ئایە کوردێك یا تورکمان یا عەرەبێك بۆ کوێ دەروات؟ لە کۆتاییدا بەرژەوەندییکان بۆ هەموو لایەکە.

من لەگەڵ ئەوەم کەوا دەڵێت کە چارەسەر کێشەی کەرکوك لە دروست کردنی هەرێمێکی فیدراڵی سەربەخۆدایە، نەك لەگەڵ ناوەند یان لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا بێت، بە هاوبەشی هەموو لایەك لە کەرکوك لە پێکهاتەکانی کاروبارەکانی ببنەرێوە لەسەر بنەرەتی هەڵبژاردنێکی راست و دروست، بەشێوەیەکی ئەوتۆ بێت کە دەسەڵاتی هیچ نەتەوەیەك لەسەر حیسابی هیچ نەتەوەیەك نەبێت، ئەم یەکێکە لەو چارەسەرانەی کە من باوەرم پێیەتی"[1].

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١. رۆژنامەی (المدی البغدادية)، لە (٢٢)ی تەموزی ساڵی (٢٠٠٩)، چاوپێکەوتنی: یوسف ئەلمحەمەداوی



*** سێیەم کۆنگرەی ساڵانە بۆ ئەو شارانەی لە باری گواستنەوەن:**

لەنێوان رۆژانی (٦-١١)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠١٢) لە پارێزگای کەرکوك کۆنگرەیەك بەسترا دەربارەی ئەو دەوڵەتانەی، کە هاوشێوەن وەکو کەرکوك لە بارەی سیاسیی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەوە و هاوشێوەی ئەو بارەن لە جیهاندا کە تاکو ئێستاکە کێشەکانیان چارەسەر نەکراوە و بەهەڵپەسێراوی ماوەتەوە، یان بە شێوەیەکی ئەوتۆ دژواری کەوتووەتە کێشەکانەوە کە چارەسەرکردن تیایدا ئەستەمە و کاریگەرییە سیاسییەکانی دەوروبەر دەوری خۆیان بینیوە لە قوڵکردنەوەی کێشەکان.

ئەوەی جێگەی سەرنجە لەم کۆنگرەیەدا کەموکورییەکی زۆری پێوە دیاربوو چ لە رووی هونەری و ئەو کەسانەی کە بانگهێشت کرابوون لە ئاست ئەو پێویستییە مێژووییەدا نەبوون بتوانن باس لە کێشەکان بکەن، یان لێکدانەوەکانیان سەنگی مەحەك بێت لە چارەسەری کێشەکان کە بە تەواوەتی ناهاوسەنگی نەتەوەیی و ئایینی و سیاسی پێوە دیارە.

لەم کۆنگرەیەدا گەلێك بابەت تاوتوێ کرا وەکو:

١. مێژوو، رۆشنبیریی، کۆمەڵگە، کورتەیەك دەربارەی رابردووی ئەم شارە.

٢. ئاسایش و پاراستن.

٣. کاروباری ئافرەت.

٤. لاوان و میدیای کۆمەڵگە.

ئەوەی جێی سەرنجە بەکارهێنانی وشەی (المدن الإنتقالیة) بەمانای شارە گواستراوەکان، کە ئەوە دەگەیەنێت لە رووی وشەوە بەو شارانە دەوترێت کە لە بارێکی گوازراوەن لەنێوان چارەسەرە سیاسیی و مێژوویی و یاساییەکاندا.

یان هەندێك جار ئەو جۆرە شارانەی وەك (کەرکوك) کۆمەڵێك کێشە و رووی ئابووری دەوری سەرەکییان هەیە لە خەمڵاندنی ئەو جۆرە چارەسەرانە یا بە واتایەکی تر کاریگەرییە ئابوورییەکانی سەر گۆرەپانی ناوچەکە دەبێتە هێڵی یەکلاکەرەوە لە چوونە سەرباری ئەو شارانە و بوونی کێشەکانی بە شێوەیەکی چارەسەرنەکراو.

بۆیە هەر لە پای ئەم بۆچوونەوە لەلایەن ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوکەوە ئەو بۆچوونە روونکراوەتەوە، کە دەڵێت: وشەی (الإنتقالیة) "ئاماژەکردن نییە بە هیچ بارێکی دەستووری و یاسایی وەکو ئەوەی هەندێك لێکیدەدەنەوە، بەڵکو هاوگونجاو هاوپەیوەستە بە قۆناغێك لە هەر شارێك یا شارۆچکەیەك لە ماوەی گواستنەوەی رژێمێکی سیاسی بۆ رژێمێکی سیاسی تر هەروەکو ئەوەی لە عێراقدا روویدا بە رووخانی رژێمی (سەدام حوسێن) لە ساڵی (٢٠٠٣)دا کە باری کەرکوکیش کەوتە ژێر کاریگەرییە سیاسییەکانەوە.

هەروەها ئاماژە کراوە بەم کۆنگرەیە لە باری ئەوەیدا کە کارەکانی چڕ کراوەتەوە لەسەر خزمەتگوزارییە سەرەکییەکان و وەبەرهێنانە ئابووری و مرۆییەکان لەلایەك و سەرکەوتنی باری ئاسایش و سەلامەتی گشتی لەلایەکی تر".

ئەم لێداونەی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك لەوەدا هات تا روونکردنەوە بدات بە (تیار المشروع العربي) دەربارەی ئەوەی کە بەیانێکیان دەرکردووە سەبارەت بەم کۆنگرەیە.

ئەوەی لەلایەنی عەرەبیدا بەرچاو دەکەوێت دەیانویست ئەوەیان بۆ یەکلابێتەوە کە تا چەندێك ئەم کۆنگرەیە لەگەڵ بەرژەوەندی باڵای عەرەب دەگونجێت لە کەرکوکدا یا ترسیان لەوەی کە تا چەندێك بەرژەوەندییەکانی عەرەب یەکانگیری ئەم کۆنگرەیە دەبێت، بۆیە لێکدانەوەکانیان هەمان ئەو بیرکردنەوانەی سەردەمی بەعسە لە پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان لە کەرکوك یان بەو واتایەی دەیانەوێت پێداگری بکەن لە خستنەرووی داواکارییەکانیان لەو کۆنگرەیەدا بێ ئەوەی تێگەیشتنیان هەبێت لە وشەی (الإنتقالیة، المؤتمر) یان بیرکردنەوەی بەو شێوەیەی کە یەکانگیربێت لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی عەرەب لە کەرکوك بۆ ئەوەی مانەوەیان یان نەمانیان تا چەندێك لەگەڵ بارە سیاسییەکەدا دەگونجێت[1].

**سەرچاوە:-**

- گۆڤاری (کەرکوك)، ژمارە (٤٥) ساڵی، (٢٠١٣)، لاپەرە (٣-٤).

*** ڕێکخراوی ئەنجومەنی کەرکوك و ناوچە کێشە لەسەرەکان ڕاگەیانرا:**

"یەکەمین کۆنفرانسی ناوچە کێشە لەسەرەکانی هەرێمی کوردستان لە هەرێمی (مانهایم)ی ئەڵمانیا بە دامەزراندنی ڕێکخراوی (ئەنجومەنی کەرکوك و ناوچە کێشە لەسەرەکان) بە ئامانجی بە دەیهێنانی پرۆژەیەك بۆ تەواوکردنی ئەرکەکان و دروستکردنی پردێکی پەیوەندی لەنێوان دەرەوە و ناوەوە و یەکێتی کارکردن لەسەر خاڵە هاوبەشەکان کۆتایی بەکارەکانی هێنا.

ڕۆژی یەکەمی کۆنفرانسەکە، لێپرسراوی مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان ووتارێکی لە بارەی پرسی ناوچە دابڕاوەکان و خەباتی ڕەوای کورد لەپێناوی ئازادیی و دیموکراسیدا بۆ بەشداربووان خستەڕوو، ئاماژەی بە بەدیهێنانی بەشێکی گرنگی ئەو دەستەکەوتانە دا کە لە دەستووری عێراقیدا بەدیهاتووە و سەرنجی بەشداربووانیشی بۆ ڕۆڵ و پێگەی کورد لە بەغداو کاریگەرییەکانی لەسەر پرۆسەی سیاسی و ڕووبەڕووبوونەوەدا لە خەباتی پەرلەمانی ڕاکێشا، ووتیشی: بە پشتبەستن بە سەرکردایەتیی سیاسیی کوردستان و جەماوەر و پەرلەمانتارانی لیستی هاوپەیمانی لە پەرلەمانی عێراق ئازایانە ڕووبەڕووی پیلانی گۆڕینی ماددەی (١٤٠) و دەستوور وەستاونەتەوە، لەو بارەیەوە دوا هەوڵەکانی گۆڕینی ماددەی (١٤٠)ی بە نموونە هێنایەوە کە فراکسیۆنی کوردی چۆن دوو جار هۆڵی پەرلەمانی عێراقی بە جێهێشت و باسی لەو سەدان هەزار کەسە کرد، کە بۆ پشتیوانی لە پەرلەمانتاران و سەرکردایەتی سیاسیی کوردستان چۆن ڕژانە سەر شەقامەکان و سیمبولی خوێناویی خۆپیشاندانی کەرکوکیشی بە بەرزترین نموونەی سووربوونی میللەتەکەمان هێنایەوە لە مقاوەمەتی کوردستانیانەی کەرکوك و باقیی ناوچە دابڕاوەکاندا و ڕەتکردنەوەی ئەو هەوڵانەش لەلایەن سەرۆکایەتیی کۆمار و بە وەڵامدانەوەیەکی دەستووری بۆ ئەو پیلانانە دایە قەڵەم.

ڕاشیگەیاند: گەر تەوافوق و ڤیتۆ نەبوایە ئەو پیلانانە بە سەرماندا تێدەپەڕی و چارەنووسی ئەو ناوچانەشمان بەرەو نادیار دەچوو، بۆیە ئەگەر ماددەی (١٤٠) لە بار ببرێت و دەستوور جێبەجێنەکرێت نەك کەرکوك و خانەقین و شەنگال، بەڵکو کاریگەیی زۆر خراپی لەسەر ئەو دەستکەوتانەش دەبێت کە بەدیهاتوون.

دوای ئەوەی کە لە ڕۆژی یەکەمی کۆنفرانسەکەدا، خوێندنەوەیەکی وورد بۆ پرۆژەی پەیڕەو و پرۆگرامی پێشنیازکراوی ئەنجومەنی کەرکوك، گەرمیان، خانەقین و بادینان کرا، پاش گفتوگۆ و تاووتوێکردنی بەند و برگەکانی لە دوا دەقی پەسەندکراودا، بە کۆی دەنگ بڕیاردرا ناوی ڕێکخراوەکە بکرێتە (ئەنجومەنی کەرکوك و ناوچە کێشە لەسەرەکان).

لە ڕۆژی کۆتایی کۆنفرانسەکەدا، (د. لوئەی جاف) لە چوارچێوەی بابەتێکیدا چەند تەوەرێکی باسکرد وەك خوێندنەوەیەکی مێژوویی مەرگەساتەکانی کورد لە سەدەی (٢١)دا.

لە کۆتایی کۆنفرانسەکەدا، ئەنجومەنی باڵای ڕێکخراوی ئەنجومەنی کەرکوك و ناوچە کێشە لەسەرەکان هەڵبژێردرا و بە ڕاگەیاندنی کۆتایی و مارشی مەشخەڵان کۆنفرانس بەسەرکەوتووی کۆتایی بەکارەکانی هێنا".

سەرچاوە:-

– ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە (٤٨١٠)، (٢)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٩)، لاپەڕە (٢)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (ڕێکخراوی ئەنجومەنی کەرکوك و ناوچە کێشە لەسەرەکان ڕاگەیانرا)، نووسینی: شەهاب.

### * ئەقلیمی کەرکوك - هەرێمی کەرکوك:

"گەلێك لایەن و رێکخراوو دەستەی ئایینی پرۆژەیان پێشکەش کردووە دەربارەی کەرکوك و چارەنووسی داوارۆژی، کە هەریەکە لەم پرۆژانەی دەرهاویشتەی گەلێك لایەنی سیاسی جۆراوجۆرن و هەوڵەکانیان لەوەدا چڕ کردۆتەوە لە بەرژەوەندی خۆیان نەخشەی بۆ دابرێژن و باسی لێوە بکەن.

ئەم پرۆژەیە لە چوارچێوەی نامیلکەیەکدا بە ناوی (اقلیم کرکوك من الشعب الی الشعب) لە نووسنی (حوسێن عەونی) بریتییە لە پێنج (دەروازە یان دەرگا) بەم شێوە:

یەکەم: بنەما سەرەکییەکان.

دووەم: دەسەڵاتی یاسادانان (ئەنجومەنی پەرلەمانی هەرێمی کەرکوك).

سێیەم: دەسەڵاتی جێبەجێکار.

چوارەم: دەسەڵاتی دادوەری.

پێنجەم: کاروباری رۆشنبیری.

**یەکەم: بنەما سەرەکییەکان:**

١. هەرێمی کەرکوك یەکێکە لە هەرێمەکانی کۆماری عێراق.

٢. ئەم هەرێمە پێك دێت لەو سنوورەی کە لە ئێستادا هەیەتی.

٣. نەتەوەکانی ئەم هەرێمە پێك دێت لە تورکمان، عەرەب، کورد، کلدوئاشووری.

٤. زمانی تورکمانی و عەرەبی و کوردی زمانی فەرمی هەرێمی کەرکوك بێت.

**دووەم: دەسەڵاتی یاسا دانان (ئەنجومەنی پەرلەمانی هەرێمی کەرکوك):**

١. ئەنجومەن پێك دێت لە ئەندامەکانی هەرێمی کەرکوك لە (٤١) ئەنجام بە رێژەی (١٣) ئەندام بۆ هەر یەکە لە نەتەوەکانی تورکمان و کوردو عەرەب و (٢) ئەندام بۆ کلدوئاشوور، هەڵبژاردنیان بە رێگای هەڵبژاردنێکی گشتی و نهێنی راستەوخۆ بێت کە سەرۆکی ئەنجومەن لە عەرەب و جێگرەکانی لە کوردو تورکمان بێت.

٢. مەرجە ئەوەی کە هەڵدەبژێردرێت بۆ ئەندامێتی ئەنجومەن دەبێت خەڵکی بنەڕەتی کەرکوك بێت.

٣. ئامانج لە یاسای هەڵبژاردنی دەبێت بە شێوەیەکی بێت کە چارەگی ئەندامەکانی ئەنجومەن لە ئافرەت بێت.

٤. رێکخستنی یاسای چۆنێتی ئەندامێتی ئەوەی کە هەڵدەبژێرێت لە هەڵبژاردنەکان.

**سێیەم: دەسەڵاتی جێبەجێکار:**

١. دەستەی سەرۆکایەتی هەرێمی کەرکوك:

ا. دەبێت سەرۆکی دەستەی سەرۆکایەتی لە نەتەوەی تورکمان بێت.

ب. دەبێت جێگری یەکەمی سەرۆکی دەستەی سەرۆکایەتی لە نەتەوەی کورد بێت.

ج. دەبێت جێگری دووەمی سەرۆکی دەستەی سەرۆکایەتی لە نەتەوەی عەرەب بێت.

٢. ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کەرکوك:

ا. ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کەرکوك دەستەیەکی جێبەجێکارە، بەڕێوەبەرو کارگێری باڵایە لە هەرێمەکەو گرنگی دەسەڵاتی جێبەجێکاری هەیە لە ژێر دەستەی سەرۆکایەتی هەرێمی کەرکوك.

ب. ئەنجومەنی وەزیران پێك دێت لە سەرۆکی ئەنجومەن و جێگرەکانی و ژمارەیەك لە وەزیرەکان کە لە (١٣) وەزیر تێپەڕنەکات.

ج. دەبێت سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران کورد بێت و دوو جێگری هەبێت لە تورکمان و عەرەب.

د. پارێزگاری بکات لە شێوەیەکی راست لەنێوان هەموو پێکهاتەکان لە ئەنجومەنی وەزیران.

**چوارەم: دەسەڵاتی دادوەری:**

١. دەبێت دەسەڵاتی دادوەری لە هەرێمی کەرکوك بە هەماهەنگی لەنێوان هەموو پێکهاتە سەرەکییەکاندا دروست بکرێت تا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی دروست پارێزگاری لە ماف هەموو نەتەوەکان بکات.

٢. دەسەڵاتی دادوەری لە هەرێمی کەرکوك پێك دێت لە دادگای کەرکوك بە هەموو جیاوازی جۆرو پلەکان.

٣. دادوەری دەبێت سەربەخۆ بێت بۆ ئەوەی کە هیچ دەسەڵاتێك لەسەر یاساوە نەبێت.

٤. پێکهاتە ئاینییەکانی ناموسڵمانەکان دەبێت ئەنجومەنی دادوەری تایبەت بە یاسای ئایینی خۆیان هەبێت.

**پێنجەم: کاروباری رۆشنبیری هەرێمی کەرکوك:**

بۆ ئەوەی هەرێمەکە بە دووری بگیرێت لە تێکەڵاوی رۆشنبیری لە نێو پێکهاتەکان پێویستمان بە دروستکردنی بەڕێوەبەرایەتییەکەی تایبەتی هەیە بۆ هەر نەتەوەیەك لە نەتەوەکانی هەرێمی کەرکوك کە لەلایەن دانیشتووانی نەتەوەکانی هەرێمەکەوە هەڵدەبژێرێت بۆ کاروبارەکانی رۆشنبیری و فێرکردن، تا بۆ ئەوەی زامنی پێویستیە رۆشنبیرییەکانی هەموو نەتەوەکان بکات لە نێو چوارچێوەی وەزارەتی رۆشنبیری هەرێم، بە شێوەیەکی ئەوتۆ بێت کە لەگەڵ خواستی پانتایی هەر نەتەوەیەکدا بگونجێت.

*** سەرنجەکان:**

١. پێویستە لیژنەیەکی هاوبەش لە پێکهاتە سەرەکییەکانی هەرێمەکە دروست بکرێت بۆ نووسینەوەی رەشنووسی هەرێمی کەرکوك تا بۆ ئەوەی هاوگونجاو بێت لەگەڵ دەستووری بنەڕەتی کۆماری عێراق.

٢. نەتەوە یەکگرتووەکان سەرپەرشتی بکات لەسەر بەڕێوەبەردنی هەرێمی کەرکوك لە ماوەی نێوان چوار تا هەشت ساڵ، بەڵام لە دواییدا گۆڕانکاری بکرێت لە رژێمی بەڕێوەبەردنی هەرێمی کەرکوك"[١].

**سەرچاوە:-**

(١) (اقلیم کرکوك، من الشعب الی الشعب)، حوسێن عەونی، چاپخانەی (الف دال)، بەغدا، ٢٠٠٨، لاپەڕە (١٢ - ١٧).

## * گەشتێکی پێنج ڕۆژی بۆ لێکۆڵینەوە لە دەوڵەتی خوارووی ئەفریقیا و کێشەی کەرکوك:

جەلال جەوهەر عەزیز

بەدەست پێشخەری ڕێکخراوی "دەستەی نەتەوەیەکگرتوەکان بۆ پیشتگیری لەعێراق"
United Nation Assistant Mission For Iraq "UNAN"
بەهاوکاریو یارمەتی ڕێکخراوی (پەیمانگای عەدالەتو ڕێکەوتن)
"Institute For Justice and Reconcilation "IJR
لەخوارووی ئەفریقیا، جەولەیەکی دیراسیان ڕێکخست، بۆ ژمارەیەك لەئەندامانی پەرلەمانی عێراقو ئەندامانی سەرکردایەتی حیزبەکانی عێراقو کوردستانی عێراق، بۆ ئەوە ئەم ناوانەی خوارەوە بانگێشت کرابوون، وەك چۆن لەراپۆرتی نێردراوی نەتەوە یەککگرتوەکان بۆ هاوکاری عێراق هاتوە:

١. عەباس ئەلبەیاتی (شیعە - ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە عێراق).
٢. شێخ عەبدولناسر ئەلجەنابی (سوننە - بەرەی تەوافوق).
٣. بەها ئەلئەعرەجی (شیعە- تەیاری سەدری).
٤. جەلال جەوهەر عەزیز (کورد - یەکێتی نیشتمانی کوردستان).
٥. مەسعود حەمە (کورد - پارتی دیموکراتی کوردستان).
٦. مەحمود ئەلمەشهەدانی (سوننە - بەرەی تەوافوق).
٧. موفق ئەلروبەیعی (شیعە - ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی).
٨. سالح موتڵەگ (سوننە - سەرۆکی بەرەی حیواری نیشتمانی).
٩. شێخ هومام حەمودی (شیعە- ئەنجومەنی شۆڕشی ئیسلامی عێراق، سەرۆکی لیژنەی نووسینی دەستوور).
١٠. یۆنادم کەنا (مەسیحی- جولانەوەی ئاشوری...).

لەم (١٠) ناوە، تەنیا ژمارە (٢)و (٦) ئامادە نەبوون، کەسەر بەبەرەی تەوافقن!

ئەو بەرێزانەی کە کاروباری سەفەرەکەیان ڕێکخستو لەگەڵماندا بوون لەرۆژی یەکەمی سەفەر لە (٤)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٦) تا دوا ڕۆژی سەفەرەکە لە (١١)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٦)، ئەمانە بوون: (دکتۆر نیکۆلاس فنك هایسم)، (پاولۆس)، (جەستن ئەلیکساندەر)، (پاوڵ) بەسوپاسی زۆرەوە، زۆر لەگەڵماندا ماندووبوون.

ئامانج لەم سەردانە، ئەوەبوو، کەئەو وەفدە چاوبخشێنێ بەو گۆرانکارییەی کە لەماوەی سەرەتای نەوەتەکانەوە ڕوویداوە لەخوارووی ئەفریقیا لەبارەی دیموکراسی، دەستوور، پەرلەمان، حکومەتو مەسەلەی دانوستاندنو ئاشتیو پێکەوە ژیان. بۆ ئەوەی سوود لەوانەو پەندەکانیان وەربگرین، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی خۆمان لەئاستی عێراقو کوردستان بۆ ئەوەی خوێنەر، شتێك بەرچاوی ڕوون بێت لەسەر باری گشتی دەوڵەتی خوارووی ئەفریقیا، بەپێویستی دەزانم کورتەیەکی هەمەلایەنە لەسەر خوارووی ئەفریقیا باس بکەم.

### * ژمارەی دانیشتووان:

بەپێی ئاماری (٢٠٠١) ژمارەی دانیشتووانی خوارووی ئەفریقیا (٤٣) چلو سێ ملیۆن کەس بووە، بەڵام بەپێی خەمڵاندنی مامۆستایانی ئەم دەورەیە، ئێستا دانیشتووانیان دەگاتە (٤٧) چلو حەوت ملیۆن کەس.
- ڕووبەری خوارووی ئەفریقیا (١٢١٩٩٥١ کم٢).
- درێژی کەناری ئاوی خوارووی ئەفریقیا (٢٩٦٨ کم).

### * لەڕووی زمان:

- (١١) یانزە زمانی ڕەسمی هەیە لەخوارووی ئەفریقیا، کە لەدەستوور دانیان پێداناوە. بەڵام نووسینی باو لەدەوڵەت زمانی ئینگلیزییە.
- ڕەشەکان (ئەفریقی ڕەسەن) (٨-١٠) زمانیان هەیە.

### *ئاینەکان:

بە پێی قسەی مامۆستاکان، خوارووی ئەفریقیا هەموو ئاینو مەزهەبەکانی جیهانیان هەیە.
- ٧٥٪ مەسیحیە.
- ١,٣٪ موسڵمانە.
- ٢٣,٧٪ ئاینەکانی ترە (هندۆس + بوزی +... ).

### * ڕەنگەکان:

- ٧٨٪ ڕەش پێستن.
- ١٣٪ سپی پێستن (ئینگلیز + هۆڵەندی).
- ٩٪ ڕەنگەکانی ترن (هندۆس +... )

### * ژنان:

- ٥٢٪ دانیشتووانی خوارووی ئەفریقیا ژنە.
- ژنان مافی وەك یەکیان هەیە لەگەڵ پیاو لەپەرلەمانو دەزگاکانی تر.
- ژن ٢٢٪ سوپای خوارووی ئەفریقیا پێك دەهێنن.
- لە کۆی (١١) قازی لەدادگای دەستووری (٣) کەسیان ژنە.
- سەرۆکی پەرلەمان لەدەوڵەتی خوارووی ئەفریقیا ژنە بەناوی (Baleka Mbete)، دایکی (٥) منالە !
- ئیلەگاندی (نەوەی غاندییە)، یەکێکە لەکەسایەتی خوارووی ئەفریقیا، ئەندامی یەکەم پەرلەمانی دوای ڕێکەوتن بووە، لە جالیەی هندییە لە خوارووی ئەفریقیا، چەندین جار گیراوە لەلایەن حکومەتی ئاپارتایدەوە، دەزگای گاندی هەیە ئێستا ئەندامی (ANC) (کونگرەی نیشتمانی ئەفریقیا) یە.

### *لەڕووی ئیدارییەوە:

خوارو ئەفریقیا، پێش ئاشتیو ڕێکەوتن پێکهاتبوو لە (٧) ولایەت، دوای ڕێکەوتن کراوە بە(٩) ویلایەت ( هەرێم).




***دەزگاكانی جێبەجێ كردن**

– حكومەتی مەركەزی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١. سەرۆكی دەوڵەت... پەرلەمان هەڵیدەبژێرێ، بۆ ماوەی (٥) ساڵ، بۆی هەیە بۆ دووەم جاریش خۆی كاندید بكاتو هەڵبژێردرێتەوە.

٢. حكومەت پێك دێت لە (٢٨) وەزارەت.

٣. حكومەتی هەرێمەكان لە (٩) هەرێم پێك دێت.

٤. دامو دەزگای جێبەجێ كردن لەشاری پریتۆریای پایتەختە.

– ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی خوارووی ئەفریقیا – بۆ بەڕێوەبردنی تەنگەژەكان.

– سەرۆكی دەوڵەت، فەرماندەی گشتی هێزە چەكدارەكانە.

– دەزگاكانی یاسا دانان:

١. پەرلەمانی خوارووی ئەفریقیا– سەرۆكی پەرلەمان ژنە.

٢. ئەنجومەنی هەرێمەكان (٩) هەرێم.

٣. ئەنجومەنی شارەوانییەكان.

– تەلاری پەرلەمان لەشاری( كیپ تاون)ە.

– ئاستی خوێندیان زۆر باشە. زانكۆكانیان لەئاستی (٥٠٠) زانكۆكانی جیهاندایە.

– بەندیخانەی سیاسیان نییە.

***دەستوور:**

– یەكەم دەستووریان لە ساڵی ١٩١٠ بووە.

– دەستووری ئێستایان لە ساڵی ١٩٩٦ پەسند كراوە.

– دادگای دەستووری، شوێنەكەی لەسەردەمی ڕژێمی ڕەگەزپەرستی بەندیخانە بووە.

– لە (١١) قازی پێكهاتوە.

– (٨) قازی پیاوە، (٣) ژنە.

– (٨) قازی ڕەشە، (٣) قازی سپیە (هی ئەم سەردەمەن).

– موفەوەزییەی خزمەتگوزاری دادوەری هەیە، لەدادگا دروست كراوە، بۆ هەڵسەنگاندنی قازیو پارێزەرەكان.

– موفەوەزیەی تایبەتی هەیە بەدیاری كردنی بەندەكانی سیاسەتی جیاوازی ڕەگەزی كە توانیویانە هەموو یاساكانی ڕەت بكەنەوە.

– یاسای حجزیان ڕەت كردۆتەوە.

– دەستەیەكی سەربەخۆیان هەیە، ئەو دەستە پێشنیاری كەسی تازە دەكات بكرێت بەقازی – ڕاگەیاندنیش ڕۆڵی خۆی هەیە لەتەقییم كردنی ئەو كەسە، هەڵبژاردنی قازی بەپرۆسەیەكی زەحمەت دا دەڕوات!

– هەموو ئەوانەی زەوی كشتوكاڵیو عەقاراتیان داگیر كرا بوو، پێیاندرایەوەو گەڕانەوە شوێنی خۆیان گەر گەڕانەوەو وەرگرتنەوە ئاڵۆز بووبێت، قەرەبوو كراونەتەوە.

– قەرەبوو تەنیا ئەوانە دەگرێتەوەكە دوای ساڵی (١٩١٣) زەویو عەقاراتیان داگیر كراوە.

***هەرێمی كوازۆلۆ- ناتاڵ:**

ڕێكخراوی (المركز الافریقي البناء لحل النزعات).

– دەستەی سەرپەرشتیاری ئەم گەشتە، ئەم هەرێمەیان وەك نمونەیەك هەڵبژارد، بۆ تێگەیشتن لەسروشتی بەڕێوەبردنو چارەسەركردن، كە ناكۆكی سیاسیو حیزبی تیایە. بۆ ئەوە بانگێشتی ڕێكخراوی (سەنتەری ئەفریقیا بۆ چارەسەركردنی كێشەكان) بووین لەشاری دوربن، پایتەختی هەرێمی كوازۆلۆ– ناتاڵ.

ئەم هەرێمە گەورەترین هەرێمە لەخوارووی ئەفریقیا، ژمارەی دانیشتووانی ئەم هەرێمە دەگاتە (١٠) دە ملیۆن کەس.
ڕێژەی توندوتیژی لەم هەرێمە زۆر بووەو، هەتا ئێستاش توندو تیژی تێدا ماوە.

* شەڕ ململانی نێوان (ANC)و (IFP):

– شەڕو ململانێ گەورەو زۆر لەنێوان کۆنگرەیی نیشتمانی ئەفریقی (ANC)و حیزبی الانقاذ للحریة (IFP) ڕوویداوە لەم هەرێمە بۆ ماوەیەك، بەهۆی شەڕی نێوان ئەم دوو حیزبە زیاتر لە ٢٥٠٠ کەس کوژراوە، ژمارەیەکی زۆر لەئەندامو دۆستی هەر دوولا ئاوارەو دەربەدەر بوون.

* کێشەی نێوان ئەم دوو حیزبە، ئەمانەی خوارەوە، هەندی لەکێشەکانەن:

١. جیاوازی لەبیرورا، لەساڵی ١٩٨٦ دەستی پێکرد.
٢. جیاوازی سەرەکییان ئەوە بوو، (ANC) بڕوای بەشۆڕش و خەباتی چەکداری هەبوو، بەڵام (IFP) بڕوای بەشۆڕشی چەکداری نەبوو.
٣. (INC) داوای دەکرد، خوارووی ئەفریقیا ئابلوقەی ئابووری بدرێ لەلایەن وڵاتانی دونیاوە، بەهۆی سیاسەتی ڕەگەز پەرستانە.

بەڵام (IFP) لەدژی ئابلوقەی ئابووری بو بۆ سەر خوارووی ئەفریقیا.

بەهۆی شەڕو ململانێ نێوان (ANC)و (IFP) هەرێمەکەش دابەش کرا بوو بەسەر هەردوو پارتە، توندوتیژی ناکۆکی گەیشتوتە ئەوەی خەڵکی سنووری (ANC) نەیتوانیوە سەردانی کەس و کاری خۆی بکات لەسنووری (IFP).

زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی ئەم هەرێمە، سەر بەهۆزی زولۆیە، بۆیە هەردوولا لەهۆزی زولو بون.

ساڵی ١٩٩٩ شەڕەکە توندتر بوو، هەموو ناوچەکەی گرتەوە، کاریگەری هەبوو بۆ سەر هەمووو ناوچەکە بەهۆی شەڕی ناوخۆوە باری ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی خراپ بوو، بۆیە لەهەموو لایەك هەوڵ هەبوو بۆ ڕاگرتنی ئەم شەڕە. هەوڵی زۆر درا بۆ ڕاگرتنی شەڕو بەرقەرارکردنی ئاشتی، لەلایەن سەرکردایەتی هەردوولا. سەرکردایەتی هەردوولا زۆر دوور نەبوون لەیەك لەئاستی خوارووی ئەفریقیا – بەتایبەتی هەردوولایان سەرقاڵی ڕێکەوتن بوون لەگەڵ حکومەتی ئەپارتاید. لەئاستی هەرێمیش سەرکردایەتی چالاك بوون...

بۆیە:

١. پەنایان برد، بۆ ئەوەی حکومەت بەرپرسیار بێ لەپاراستنی ناوچەکەو دەزگاکان و کۆنترۆڵی کردنی ناوچەکە– ئەمە سەرکەوتوو نەبوو.
٢. ئەمجارەیان پەنایان بردە بەر دادگا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان– ئەمیش سەری نەگرت.
٣. لیژنەیەکی هاوبەشی هەردوولاو دادگای هاوبەش – ئەمیش سەری نەگرت.
٤. دواجار داوایان کرد هەموو لایەنەکان (کەنیسە + ڕێکخراوی جەماوەری، دیموکراسی، پیشەیی، رجال اعمال، کەسایەتی ) بەشداری دانوستاندان بکەن.

ئەم قۆناغانەی دانوستاندن لەنێوان ئەم دوو حیزبە گرنگی خۆی هەبوو بۆ تێگەیاندنی چەکدارو جەماوەر لەگرنگی ئاشتی و پێکهاتن، بەتایبەتی ئەوان هەردوولا بەیەکەوەو بەهاوبەش خەریکی مفاوەزەت بوون لەگەڵ دوژمنی سەرەکییان...

بۆ تێگەیشتن لەو ووردەکاری ئەم ململانێیە، دوو سەرکردەی سەربازییان هێنا، یەکیان سەرکردەی سەربازی (ANC) بوو لەناوچەکە، ئەویتریان قائدی سەربازی (IFP) لەناوچەکە... وەك ئەوەی بەڕێوەبەری پەیمانگای (المرکز الافریقي البناء لحل النزاعات) باسی کرد، ئەم دوو فەرماندەیە، ڕۆڵی باشیان هەبوو بۆ ئاشتی و ڕیکەوتن لە ناوچەکە.

* دەرس و پەندەکانی ئەم شەڕو ململانێیە ئەوەیە:

١. سەرکردایەتی ناوچەکە ڕۆڵی چەند گرنگی هەیە، گەر مەبەست بێ.
٢. گرنگی حیزب و ڕێکخراوەکان، ڕێکخراوی دیموکراتی، جەماوەری، پیشەیی، ئاینی و ڕێکخراوی ناحکومی. ڕۆڵیان لەبەئاگاهێنانەوەی جەماوەرو هەڵوێست وەرگرتن لەو مەسەلە چارەنووسازانە.
٣. گرنگی کەسایەتی، کۆمپانیاکان، رجال اعمال، جەماوەر، و ڕۆڵ و هەڵویستی گرنگیان بۆ پێداگرتن لەمەسەلەیەك، کە چارەنووسی ئەوانەیش دەگرێتەوە.

شەڕو ململانی نێوان ئەم دوو حیزبە، زۆر لەشەڕو ململانێی نێوان (ی.ن.ك)و (پ.د.ك) دەچێ لەکوردستان!

*حکومەتی ئیقلیمی لەکوازۆلۆ-ناتال...

ئەمەش نمونەیەکی حوکمرانییە لەیەکێك لەگەورەترین هەرێمەکانی خوارووی ئەفریقیایە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران (Premier of Kwazulu-Natal) پێشوازی لێکردین کەسەر بەحیزبی (ANC)یە، پێناسەی کوازۆلۆ-ناتالی بۆ کردین وتی:

– کوازۆلۆ واتە بەهەشت.
– ناتال بەزمانی پورتوگاڵی، واتە لەدایکبوون (میلاد).

مانای کوازۆلۆ-ناتال دەبێ بە (بەهەشت و لەدایك بوون).

– وەزیری دارایی لەگەڵ بوو...

ووتی: نیزامی ئیداریمان بەم شێوەیە:

١. حکومەتی مەرکەزی.
٢. حکومەتی هەرێم.
٣. حکومەتی ناوخۆ.

هەمووشی لەرێگای هەڵبژاردنەوە دەبێت، حکومەتی ئێمە سیماتی فیدراڵی تێدایە!

ووتی:

هەر هەرێم و ناوچەیەك تایبەتمەندی خۆی هەیە، مافی خۆیەتی پراکتیزەکردنی تایبەتمەندی خۆی بکات.

– پەرلەمانی هەرێم (٨٠) کورسییە، (٣٥) کورسی هی (ANC)یەو (٣٥) هی (IFP)یە... (هەڵبژاردنی پێشوو).

–لەهەڵبژاردنی (٢٠٠٤) (ANC) زۆرینەی کورسیەکانی هێنا بەڵام بەتەنیا حکومەتی دروست نەکرد. هەروەها (ANC)

هەڵبژاردنی شارەوانییەکانیشی بردەوە، لە (٦١) ناوچە، (ANC) (٣٣) ناوچەی بردەوە.

**- لەم هەرێمە:**
(٨) ملیۆن ڕەشی تێدایە.
(١) ملیۆن هندی.
(٤٥٠) هەزار سپی.
ئێستا ململانێ کەم بووە... سپییەکانیش دەنگ بە (ANC) نادەن!
ئێستا لەم هەرێمە کاتی بوژانەوەیە، بوارەکانی پیشەسازیو کشتوکاڵو گەشتو گوزار، ئاوەدان کردنەوەو بیناسازی لە گەشەکردنو زیاد بووندایە.
وەزیری دارایی:
کورتەی قسەکانی...
-مەسەلەی ئینتما بۆ خاكو وڵات لەسەر بنچینەی یەکسانی دەبێ.
-فێربووین، چۆن درك بەترسی بەرامبەر بکەینو دانی پێدابنێین.
-فێر بووین چون لەبەرامبەر خۆش بین.
-لەئیدارەش، سەرەتاو پرەنسیپەکان تا ڕادەیەك نەگۆڕە، دەزگا هەیە... سەرکردەکانی بەردەوام لەگۆڕاندایە...

*** سەرچاوەی داهاتیان:**
- باج، بەرهەم هێنان سەرچاوەی سەرەکی داهاتیانە.
- (٩٩٪) میزانییەی ئەم هەرێمە لەمەرکەزەوەیە.
- هەرچی واریداتیان هەیە دەبێ بگەڕێتەوە بۆ مەرکەز.
- نیزامی دابەش کردنی واریدات بۆ سەر هەرێمەکان لەسەر بنچینەی: ژمارەی دانیشتووانی هەرێم، ڕێژەی هەژاری، داهاتی هەریم.
- داهاتی ئەم هەرێمە لە گەشتو گوزار (١٦٪)ی داهاتی گەشتو گوزارە لە هەموو خواروی ئەفریقیا، بە پلەی دووەم دێت، دوای هەرێمی خاوتینگ (جۆهانزبیرگو بریتۆریا)، کە داهاتی ئەوان (٣٣٪).
- لە ئاستی هەموو خوارووی ئەفریقیا، لەڕووی داهاتەوە، ئەم هەرێمە بەپلەی دووەم دێت.
- لەسەر شێوەی دەوڵەتی خوارووی ئەفریقیا، وەك دیار بوو ڕای جیاجیا هەبوو، لێپرسراوو ئەکادیمییەکان ڕای جیایان هەبوو... هەندێکیان بەدەوڵەتی مەرکەزی ناویان دەبرد، هەندێکیان بە دەوڵەتی فیدراڵی ناویان دەبرد، هی وایان هەبوو دەیان گووت فیدراڵیەتە یان سیماتی فیدراڵی تێدایە.
بەپێی ئەوەی لەنموونەی هەرێمی کوازۆلۆ-ناتال تێگەیشتین، هەرێمەکان دەسەڵاتی ئەو تۆیان نییە لەڕووی ئیداریو داراییو پەیوەندییەکانەوە...
لەڕووی ئیدارییەوە، تەنیا بوارە خزمەتگوزارییەکان سەر بەخۆی تێدایە، ئەویش تەمویلی لەمەرکەزەوەیە.
کاروباری دارایی هەرێم بەگشتی مەرکەزییە، داهاتو واریدانی هەرێم بەگشتی دەگەڕێتەوە بۆ مەرکەز... بۆیە بەپێی ئەو هەرێمە، دەوڵەتی خوارووی ئەفریقیا زیاتر لەدەوڵەتێکی مەرکەزی دەچێت.
چونکە زۆرینەی ڕەشەکان لەو هەرێمانە دەژین، کەداهات کەمترە بە بەراوورد لەگەڵ ئەو، هەرێمانەی کە ڕێژەی سپی زۆرە، وەك هەرێمی خوتینگ (جۆهانزبیرگ + بریتوریا)، کە



داهاتیان لەئاستی خوارووی ئەفریقیا زۆرەو دەگاتە (٣٣٪)ی داهاتی وڵات، گەر بەراوورد بکرێت لەگەڵ (٨) هەرێمەکەی تر. هەروەها هەرێمی رۆژئاواش، کە پایتەختەکەی کەیپ تاونە داهاتی ئابووریان لەچاو هەرێمەکانی تر. بەتەقدیر گەر هەرێمەکان سەربەخۆی ئابووریان هەبوایە، رەنگە ئەوە لەبەرژەوەندی سپییەکان بوایە، بەو پێیە رەشەکان‌و رەنگەکانی تر سوودمەند نەدەبوون. کە سیستەمی فیدراڵی پەسند نەکراوە، زیاتر لەبەر هۆی ئابوورییە نەك سیاسی.

*** بواری ئابووری لەخوارووی ئەفریقیا:**

١. **کشتوکاڵ**: قورسایی بارانی ئەو وڵاتە لەهاویندایە.

- دارستانی زۆریان هەیە، بۆ هەموو بوارەکان بەکار دێت (پیشەسازی دار).
- گەورەترین کێڵگەی قامیشی شەکریان هەیە.
- هەموو جۆرە میوەیەکیان هەیە.
- سەوزەی جۆراوجۆرو هەمیشەییان هەیە.
- لەبەرهەم هێنانی گوڵ موناقەسەی هۆڵەندە دەکەن، رەنگە رۆڵی ئەو هۆڵەندیانەی تێدا بێ، کە بەسەدان ساڵە لەخوارووی ئەفریقیا دەژین.

بەحوکمی ئەوەی رووبەری ئەم وڵاتە زۆر پان‌و بەرینە‌و لەسێ لاوە دەکەوێتە سەر ئۆقیانووس، بۆیە کەش‌و هەواکەی هی ئەوەیە لەهەر چوار فەسڵەی ساڵ بەرهەمی جۆراوجۆری کشتوکاڵیان هەبێ، کشتوکاڵ تەکنیکی زۆری تێ کەوتوە.

٢. **بواری پیشەسازی**: باری پیشەسازی لەخوارووی ئەفریقیا لەبرەو دایە، لەبواری پیشەسازی سووك‌و قورس:

- دەرهێنانی زێر، ئەلماس، ئەلەمنیۆم، ئاسن.
- کارگەی ئاسنیان هەیە.
- کارگەی دروست کردنی ئۆتۆمبیلی جۆراوجۆریان هەیە، وەك مارسیدس، BMW، تویوتا، ئۆتۆمبیلی سەربازی.
- کارخانەی چەندین جۆرە چەکی سووك‌و قورسیان هەیە.
- کارگەی جۆراوجۆری خواردن‌و خواردنەوەیان هەیە.

٣. **بواری گەشت‌و گوزار یان پیشەسازی گەشت‌و گوزار:**

خوارووی ئەفریقیا، وڵاتێکی یەکجار جوانە بەهۆی ئەوەی لەسێ لاوە (رۆژهەڵات، رۆژئاوە، خوارو) دەکەوێتە سەر ئاو. دەکەوێتە نێوان هەردوو ئۆقیانووسی هندی‌و ئۆقیانووسی ئەتڵەنتیکی خواروو، ئەمانە وایکردووە خوارووی ئەفریقیا کەش‌و هەوایەکی خۆش‌و جوانی هەبێت.

ئەگەرچی خوارووی ئەفریقیا دوورە لە ئەمریکا‌و ئەورووپا‌و ئاسیا، ئوسترالیا، لەگەڵ ئەوەشدا، خەڵکی وڵاتانی دونیا بەدەیان هەزار کیلۆمەتر رێگا دەبرن، بۆ بینینی ئەو وڵاتە، بۆیە گەشت‌و گوزار بۆتە یەکێك لەسەرچاوە گرنگەکانی ئابووریان شارەکانی کیپ تاون، دوربین، پورت الیزابیث، وەك دورگە وان لەناو ئۆقیانووس، ئەمیش ئەوەندەی تر ئەو شارانەی خۆش کردوە. دورگەی رۆبن، کە پێشتر بەندیخانە بووە، و کەسایەتی وەك نێلسن ماندیلای تێدا بەندبوە، ئێستا بۆتە مۆزەخانە لەژێر چاودێری (UN) دایە، ساڵانە سەدان هەزار گەشتیاری بۆ دێت، لەساڵی رابوردوو چوار سەد هەزار گەشتیاری بۆ هاتووە.

٤. **وەبەرهێنان:**

دەوڵەتی خوارووی ئەفریقیا، دەرگای وڵاتی خۆی کردۆتەوە، بۆ هەموو وڵاتانی دونیا، بۆ مەبەستی وەبەرهێنان بۆیە ئەمیش بەیەکێك لەسەر چاوە بنچینەییەکانی ئابووری دەژمێردرێ لەو وڵاتە.

٥. **باج‌و گومرك:**

- بەحوکمی ئەوەی خوارووی ئەفریقیا دەوڵەتێکی موئەسەساتییە تا رادەیەك لەرووی خزمەت گوزارییەوە چۆتە پێشەوە، بۆیە توانیویەتی ئەو بوارە بەشێوەیەك کۆنترۆڵ بکات، باج دانانی کردوە بکات بەیەکێك لەسەر چاوە هەرە سەرەکییەکانی داهات.
- **نیزامی ئابووری ئازاد**: لەسەرەتاوە زۆر زەحمەت بوو بۆ خەڵکی هەژاری ئەو وڵاتە، بۆیە حکومەت خزمەتگوزاری پێشکەش کردووە، بەتایبەتی ئاو، کارەبا، تەندروستی، هەروەها خوێندن، حکومەت خۆی لەئەستۆی گرتوەو کارئاسانی بۆ هاووڵاتیان کردووە.
- موازەنەی ساڵانە مەرکەزییە، باج بەگشتی لەمەرکەز کۆ دەکرێتەوەو نیوەی موازنەی ساڵانە، ئەدرێتەوە بەهەرێمەکان، لەسەر بنچینەی:

١. ژمارەی دانیشتووان.

٢. رێژەی هەژاری.

٣. داهاتی هەرێم، دابەش دەکرێت بەسەر هەرێمەکاندا.

- موچە ئەدرێت بەپیر، پەکەوتەو کەم ئەندام.
- یارمەتی دارایی ئەدرێ بەمناڵان.

خزمەتگوزاری ئاو، کارەبا، نیزامێکیان بۆ داناوە، ئەوەی کەمتر ئاو‌و کارەبا سەرف بکات، کەمتر پارە ئەدات، یان عەفو دەکرێت.

- رێژەی بێکاری لەخوارووی ئەفریقیا (٢٩٪) یە.
- کۆمپانیای حکومەت کاروباری ئەم بوارانەی لەئەستۆ گرتوە: ئاو، کارەبا، فرۆکەوانی (طیران).
- خوارووی ئەفریقیا، شوێنێکی بازرگانی گرنگی هەیە، چونکە دەکەوێتە سەر رێگای نێوان هەردوو ئەمریکا لەلایەك‌و، ئوسترالیا‌و بەشێکی وڵاتانی خوارووی رۆژهەڵاتی ئاسیا لەلایەکی تر ئەمیش لەرووی بازرگانییەوە داهاتی بەرچاوی هەیە.

*** جوڵانەوەی ئاوەدانکردنەوەو بوژانەوە:**

ئەوەی ئێستا هەیە لەخوارووی ئەفریقیا، لەپێناو ئاوەدانکدنەوەو رێگاو بان، پرد، داموو دەزگای پەیوەندی، کارخانەی چەك، ئۆتۆمبیل... هەموو ئەو پێشکەوتنە، هی سەردەمی رژێمی جیاوازی رەگەزیی، لەم (١٠-١٢) ساڵەی رابردوو، خوارووی ئەفریقیا پێشکەوتنی وای بەخۆیەوە نەبینوە شایانی باسە لەرووی بیناو ئاوەدانکردنەوە.

ئەوەی لەم ماوەیەدا کراوە، تەنیا پێشکەوتنی سیاسی گەورە بووە، لەرووی دیموکراسی، مافی مرۆڤ‌و دادپەروەری.

ئەو پێشکەوتنەی ئێمە بینیمان لەشارەکانی کەیپ تاون، جۆهانزبێرگ، پریتۆریا، دوربین، هیچی کەمتر نییە، لەشارە جوان و پێشکەوتووەکانی ئەوروپا، ئەمریکا، یابان، بەپێی قسەی ئەوانەی لەوێ دەژین، ئەم پێشکەوتنە لەهەموو هەرێم و شارەکان وەك یەك نییە، بەهەڵسەنگاندنی ئەوان (٥) هەرێم لەکوێ (٩) زۆر پێشکەوتووە، چوار هەرێمەکەی تر لەئاستی ئەم (٥) هەرێمەدا نیە لەڕووی ئابووری و پێشکەوتنەوە.

*** بواری سەربازی لەخوارووی ئەفریقیا:**

سوپای دەوڵەتی خوارووی ئەفریقیا، پێش ئاشتی و ڕێکەوتن لەسپییەکان پێکهاتبوو بەشێوەی یاسای سەربازی زۆرە ملێ بوو، ڕەشەکان لە سوپای کۆن، وەك باسیان کرد تەنیا یەك ئەفسەریشیان نەبوو.

سوپای یاسایی ڕەگەزپەرست، سوپایەکی زۆر بەهێزو پڕ چەك و دڕ بووە، بۆیە توانیویەتی چەند جارێك سوپای ANC بشکێنێ و هەرەسی پێ بهێنێ.

– سوپای ئەمڕۆی خوارووی ئەفریقیا لەهەموو ڕەنگەکانی ئەو وڵاتە پێکهاتووە، هەر یەکەیان بەپێی ڕێژەی خۆیان.

– ڕێژەی پیاو لەسوپای نوێ (٧٨٪)، ڕێژەی ژن (٢٢٪)ی سوپایە.

– یاسای سەربازی زۆرە ملێی نیە، (ئارەزوومەندانەیە).

– ڕێژەی (٢٥٪)ی سوپاکە لە سپییەکانە لەهەموو ئاستەکان، بەڵام ڕێژەیان لەکەم بووندایە.

– پێش ١٩٩٤ تەنیا یەك ئەفسەری ڕەشیش لەو سوپایە نەبوو، هەتا ئێستا جەنەراڵی ڕەش پێست لەو سوپایە دروست نەبووە.

– یەکخستنی سوپای دەوڵەت و سوپای ANC چۆن بوو؟

١. کۆنگرەیەکیان بۆ هێزەکانی ئۆپۆزسیون (میلیشیات) ڕێکخست بۆ دانانی بەرنامەیەك، بۆ یەك خستنی ئەو دوو هێزە (کۆنگرەی ئەزاگۆ).

٢. لیژنەیەکی سەربازی هاوبەش پێکهات، بۆ ئەوەی ئەو پرۆسەیە لەئەستۆ بگرێ. هەموو لایەك بەڕاشکاوی مەترسییەکانی خۆیان بۆ یەکتر ڕاگەیاند.

٣. هێزێکی هاوبەش لە ANC و حکومەت (سپییەکان) دروست کرا بۆ ئەوەی پاراستنی وڵات و ئاسایشی ناوخۆ لەئەستۆ بگرن، بۆ ئەو ماوەیە.

٤. سەرکردایەتی سیاسی هەردوولا ڕۆڵی گرنگیان هەبوو، بۆ ڕازی کردنی سوپای هەردوولا.

ماندێلا لەسەرەتاوە، کۆبوونەوەیەکی فراوانی ئەنجامدا لەگەڵ سەرکردایەتی سەربازی حکومەتی (سپییەکان)، بۆ دڵنیا کردنیان، پێی ڕاگەیاندن، نامانەوێ لەشکری سەربازی لەناوبەرین، بەڵام دەبێ ئێوەش بزانن، کە ئەم میللەتەش بەئێوە تەواو نابێ.

هەردوولا لەسەرەتاوە زۆر لەیەك ئەترسان، بەڵام دوای دانوستان، بڕواو متمانە لای هەردوولا دروست بوو.

٥. لیژنەیەکی ڕاوێژکاری (استشاری) بەریتانی هاوکاری و کارئاسانی زۆری بۆ کردن، لەپرۆسەی یەکگرتنەوەی هەردوولا.

٦. زمانی فەرمی لەدامو دەزگاکانی وەزارەتی بەرگری ئینگلیزییە.

٧. ئێستا سوپای خوارووی ئەفریقیا، ڕۆڵی گرنگیان هەیە بۆ کاروباری غەیری سەربازی، وەك ڕێگەگرتن لەشەڕی ناوخۆی نێو وڵاتان، وەك ئەوەی لە (ڕواندا) بوو، بۆ هاوکاری و یارمەتی لێقەوماوانی لافاوو بومەلەرزە.

*** ماندێلا و بەندیخانەی دوورگەی ڕووبن ( Robben Island )**

– ئەم دوورگەیە، ڕووبەرێکی کەمی هەیە، دەکەوێتە ناو ئۆقیانووسی ئەتلەنتیکی خواروو ماوەی نیو کاتژمێر (بەپاپۆڕێکی گەشتی) دوورە لە شاری کەیپ تاون.

– بەندینخانەیەکی زۆر ڕێکوپێکی تێدا دروستکراوە.

– هۆڵی گەورەی تێدایە بۆ زیندان، بەدەیان کەس دەگرێ، قەرەوێڵەی دوو قاتی تێدایە.

– ژووری تەنیایی (انفرادی) (٢م ٢ xم) تێدابوو، بینایەکی زۆر تووندوتۆڵ بوو.

– لەنزیك بەندینخانەکە، کانە بەردێك هەبوو، بۆ کاری قورسی بەندەکان ( الاشغال الشاقە)، لە جێگایەك بەردیان لێ هەڵدەکەندن و لەجێگایەکی تر دیواریان بەو بەردانە دروست دەکرد، بۆ ڕێگەگرتن لەشەپۆلی ئاوی ئۆقیانوس.

– ئەم بەندیخانەیە، بۆ زیندانی سیاسی و تاوان بووە، تەنیا بۆ ڕەش پێستەکان بووە، یەکجار جوولەکەیەکی سپی پێست لەوێ حوکم ئەدرێ بۆ هەتا هەتایی، دەیگوازنەوە بۆ بەندیخانەی شارەکان.

– ماندێلا، لە ژوورێکی (٢م × ٢م) بۆ ماوەی ١٨ ساڵ زیندانی بووەو (٩) ساڵەکەی تر لەجێگایەکی تر بەند بووە.

ژیاننامەی ماندیلا لەم بەندینخانەیە نووسراوە، لە کتێبێکی ٨٠٠ لاپەڕەیی.

– ماندیلا ٢٧ ساڵی لە بەندینخانە تەواو کردووە.

– هەڵسوکەوتیان لەگەڵ زیندانی تاوان زۆر باشە، بەندی تاوان مافی زۆر زیاترە لەزیندانی سیاسی، لە خواردن، جلوبەرگ و شوێن ڕۆژنامەو تەلەفزیۆن مواجهەھە.

– مامەڵەیان زۆر خراپ بووە لەگەڵ زیندانە سیاسییەکان.

– باوکی ئیمیکی (سەرۆك کۆماری ئێستا) لەگەڵ ئەمان زیندان بووە. لەزیندان جیاوازی هەبووە لەنێوان ڕەش و ڕەنگەکانی تر، لە خواردن و جلوبەرگ و مواجهەو ڕۆژنامە.

– ئەم دوورگەیە ئێستا بووەتە شوێنی گەشت و گوزارو، لەلایەن UN دەپارێزرێ، دوورگەیەکی زیندووە، بۆتە مۆزەخانە.

– ٨ کەس لەم بەندینخانەیە حوکم درابوون، بەهەتاهەتایی لە ساڵی (١٩٦٣) تا هەشتاکان، تەنیا سەد کەس لەم زیندانە کوژراوە.

– ئەم بەندینخانەیە، لەسەر دەستی زیندانییەکان دروست کراوە.

– ساڵانە بەسەدان هەزار کەس سەردانی ئەم مۆزەخانەیە دەکەن، ساڵی ڕابردووو ٢٠٠٥، چوارسەد هەزار کەس سەردانیان کردووە.

– نێلسن ماندیلا: لەهۆزی کۆزۆیە، لەبنەماڵەی شای

(مەلیکی) ئەو هۆزەیە، ماندیلا لەمنداڵیەوە نیشانەی سەرکردایەتی تێدابووە (قسەی هاوڕێیەکی خۆیەتی کە زیاتر لەدەساڵ لەگەڵی زیندانی بووە).

*** باری سیاسی لەخوارووی ئەفریقیا:**

هەر وەك لەسەرەتاوە باسمان کرد، خوارووی ئەفریقیا، وڵاتێکە زۆربەی رەنگو رەگەزو ئایینو مەزهەبەکانی تێدایە، هۆڵەندییەکانو دواتریش ئینگلیز ئەو وڵاتەیان داگیر کردووە، سپییەکان زیاتر لە ٣٥٠ ساڵ حوکمی ئەو وڵاتەیان کرد، توانیویانە لەو ماوەیەدا ئەو وڵاتە پێش بخەن تا رادەیەك، بەبەراوورد لەگەڵ وڵاتانی دراوسێدا، سپییەکان لەماوەی حوکمرانی خۆیان زۆر بەخراپی مامەڵەیان لەگەڵ رەشەکانی رەسەنی وڵاتو رەنگەکانی تر کردووە لە کوشتنو راگواستنو بێ بەش کردن لەهەموو مافێکی ئابووری، سیاسی، مرۆڤایەتی، رۆشنبیریو کۆمەڵایەتی.

کار گەیشتە ئەوەی (٨٧٪)ی زەوی کشتوکاڵی داگیر بکاتو خاوەنەکانیان کە دوو ملیۆن دەبوون دەربکرێن لەشارە گەورەکان تا وای لێهات (٧٥٪)ی دانیشتووانی خوارووی ئەفریقیا، لەسەر (١٣٪) زەوی خوارووی ئەفریقیا بژێن، بێگومان کۆکردنەوەی ئەو ژمارەیە بۆ چەندین ئامانج بووە، لەوانە کۆنترۆڵ کردنی رەشەکانو رەنگەکانی تر.

لەبەرامبەر ئەم هەموو زۆڵمو ستەمە، چەندین جوڵانەوەی سیاسی دروست بووە، لە ساڵی (١٩٥٢) نێلسن ماندێلا سەرکردایەتی جوڵانەوەیەکی سیاسی کردووە لەدژی رژێمی رەگەزپەرستی، لە ساڵی (١٩٥٥) بەرەیەکی سیاسی دروست کردوە لەژمارەیەك تەیاراتی سیاسی لەچوار چێوەی ANC کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی، لە ساڵی (١٩٦١) باڵی سەربازی دروست کردووە لە ANC، بەو شێوەیە هاوپەیمانێکی پتەو دروست بووە لەنێوان رەنگە جیاوازەکان، لەسەر بنەمای پەیماننامەی ئازادیی (میثاق الحرية).

پەیماننامەی ئازادی لەسەر ئاستی کیشوەری ئەفریقیادا هەیە، وڵاتانی کیشوەری ئەفریقیا بەگشتی پشتگیریان لەشۆرشی خوارووی ئەفریقیا کرد، هەروەها وڵاتانی سۆڤیەتو ئەورووپای رۆژهەڵات یارمەتیەکی زۆری شۆرشەکەیان دا بەچەكو پارە.

لە ساڵی (١٩٦١)دا ماندیلا داوای پاراستنی مافی نەتەوەکانی کرد، داوای فرەیی کرد لەرژێمی ئاپارتاید، لە ساڵانی (١٩٨٣-١٩٨٤) نەوەیەکی نوێو خوێندەوار پەیدابوون لەناو ANC، چینی مام ناوەند لێی کۆمەڵ بوون، دەرچووی زانکۆبوون، بروایان بەچارەسەری سیاسی هەبوو، لەکۆتایی هەشتاکاندا باری ئابووری باشتر بوو، ژمارەی دەرچووی خوێندکاری رەش لەزانکۆکان زیاتر بوون لە سپیو، ژمارەی دەرچووی خوێندکاری رەش لەئامادەیی، زیاتر بوو لەسپی. گەشەکردنی باری ئابووریو پێشکەوتنی باری کۆمەڵایەتی، دوو فاکتەری گرنگ بوون بۆ گۆڕانی سیاسی.

لە ساڵی ١٩٨٧ ماندێلا داوای گفتوگۆی لە حکومەت کردو، رەت کرایەوە بەڵام هەر لەو ساڵەدا رژێمی ئاپارتاید گەیشتە ئەو بڕوایەی کە ئەم کێشەیە بەشەڕ چارەسەر ناکرێت، چونکە رژێم چەند جارێك هەرەسی بەشۆڕشەکەیان دەهێنا، بەڵام سەری هەڵئەدایەوە، بەدەست پێشخەری سەرۆك کۆماری خوارووی ئەفریقیا (دی کلێرك)، نەلسن ماندیلا ئازاد بوو لەبەندینخانە لەسەرەتای نەوەتەکان، ئەمەش کەشو هەوایەکی تازەی دروست کرد بۆ ئاشتیو پێکهاتنو گفتوگۆ.

ماندیلا هەوڵیدا، هەموو لایەنە سیاسییەکان بەشداربن لە گفتوگۆ لەگەڵ حکومەت، حکومەت داوای کرد کە شوعیەکان بەشدار نەبن لەو دانوستانە، بەڵام پەسەندیان نەکرد.

پرسیارمان کرد، چۆن سپییەکان، قەناعەتیان کرد، گفتوگۆ بکەنو بەشداری هەڵبژاردن بنو، دڵنیان ئەنجامی هەڵبژاردنەکە بەبردنەوەی ANC تەواو دەبێ، یان چۆن دی کلێرك چووە ئەم دانوستانە، کە دەیزانی لەهەڵبژاردن دەدۆڕێ.

مامۆستاکان رایان وابوو:

١. دی کلێرك تەقدیری باری وڵاتەکەی خۆی کرد، کە ئەم کێشەیە بەشەڕ چارەسەر ناکرێت، باری ناوخۆی وڵات بەرەو خراپتر دەبات لەرووی سیاسیو ئابوورییەوە.

٢. هەرەس هێنانی یەکێتی سۆڤیەت، بووە هۆی ئەوەی مەترسی حیزبی شیوعی نەمێنێ لەسەر وڵات.

٣. دابرانی (عەزل بوونی) دەوڵەتی خوارووی ئەفریقیا لە وڵاتانی دونیا، بەهۆی بچڕاندنی پەیوەندییان لەگەڵ رژێمی ئاپارتاید، ئەمیش فاکتەری گرنگ بووە.

٤. زەمانەتی نێودەوڵەتیو دەستوور، مافی هەموو لایەك دەپارێزێ.

٥. رەشەکان شارستانییەتی خۆیان هەیە، گەلێکی یەکگرتوون، ئەمیش فاکتەرێك بوو بۆ ناچار کردنیان.

لەچاوی هەندێ لەسپییەکان، دی کلێرك سەرۆك کۆماری سەردەمی دەسەڵاتی سپییەکان خائینە.

*** ئەی چۆن رەشەکان رازی بوون پێك بێن لەگەڵ کەمینەیەك کە ١٣٪ وڵات پێکدێنێو ئەو هەموو زوڵمو ستەمەی کردوە؟**

رای سەرۆك کۆمار (Thambo Mbeki)و ژمارەیەك لەسیاسیو ئەکادیمییەکان:

- ANC حیزبێکی کۆنەو، رۆڵی گرنگی هەیە، بۆ وشیار کردنەوەی کۆمەڵ، بۆ ئاشتیو دیموکراسی، ئەوە بووە هۆی بروا هێنانی زۆرینەی ANC بەم سیاسەتە، بۆ ئەم مەبەستەش رێکخراوی ئاشتیو دادپەروەریمان دروست کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کێشەی زۆرمان بۆ دروست بوو.
- رای هەندێ لە ANC ئەوەیە، کە حیزبەکەیان خیانەتی لێکردون لەسەر مەسەلەی ئاشتیو گفتوگۆ، دابران لەناو حیزب دروست بووە لەنێوان میانرەوەکانو توندرەوەکان، ٣٠٠ کەس لەو توندرەوانەیان نارد بۆ دانوستان، ئەوانەیان داخلی دەورە کرد بۆ ئەو مەبەستە.

* ئەو هۆکارانە چی بوو، بووە هۆی نزیك بونەوەو ئاشتیو دانوستاندن... بەرای ئەوان ئەم فاکتەرانە بوو:
١. فاکتەری سیاسی، ئیرادەی سیاسی لەنێوان هەردوولا.
٢. فاکتەری دەرەوە: فشاری نێودەوڵەتی بۆ سەر هەردوولا.
٣. دەرکەوتنی ژمارەیەك سەرکردایەتی لە هەردوولا، کە ژیرانە مامەڵەیان لەگەڵ کێشەکە کرد، وەك نیلسن ماندێلاو دی کلێرك، سەرۆکی دەوڵەتی خوارووی ئەفریقیا، رای نیلسن ماندیلاو دی کلیرك ئەوە بوو، کە کێشە بەرێگای کێشە چارەسەر ناکرێت، دەکرێ بە گفتوگۆ دەستکەوتو ئامانجی وا بەدەست بێ، بەشەر بەدەس نەیەت.
قۆناغی گواستنەوە لەساڵی ١٩٨٧ دەستی پێدەکات لەنێوان رژێمی ئەپارتاید لەلایەكو، هەموو حیزبو رێکخراوەکان لەلایەکی تر، ئەم قۆناغە ٦ ساڵی خایاند، رایان وابوو وەك باوەر کە:
١. دانوستاندنی بەپەلە نەکەن.
٢. دانوستاندن بەردەوام بێ.
٣. هەندێکیان رایان وایە بەرنامە چەسپاو نەبێ، بەرنامە بەپێی پێویست بێت.
٤. مساوەمە کردن لەپێناو ئامانجی گشتیو گەورەو پیرۆز بکرێت.
٥. کەس براوە نییە، بەڵکو تەوافوق بنچینەی عەمەلیەیی سیاسییە.
٦. تاوانباران لەهەرلایەك بن نەدرێن بەعەدالەتی ناوخۆو عەدالەتی نێودەوڵەتی، هەموو لایەك عەفو بکرێن، چونکە گەر وانەبوایە دەبوو هەموو سوپا بدرێ بەدادگا.
٧. کێشەی قوربانیانی هەدوولا بەمرونەت چارەسەر بکرێ.
٨. دانی زەمانەت بەسپییەکان کە دەرنەکرێن لەوەزیفەو دامودەزگاکانی سەربازی.
٩. بەرێزەوە مامەڵە لەگەڵ یەك بکەین، بەووردیو قوڵی گوێ لەیەك بگرین، بەعینایەتو راشکاوی قسە بکەین، بەشێوەیەك دوژمن (بەرامبەر) بزانێ لەچی ئەترسێنو مەترسیت لەچیدایە. هەروەها دەبێ تێبگەین مەترسی بەرامبەر لەچیدایە.
١٠. ئەرکی ئێمە هەڵسەنگاندنی پێویستی ئەساس هەموو لایەکە، تەنانەت پێویستی دوژمنەکانیشمان، ئەوانەی لە رابوروودا زوڵمیان لێکردین.

* ئامانج لەدانوستاندن:
- دەوڵەتی خوارووی ئەفریقیا بکرێت بەدەوڵەتێکی یەککگرتووی دیموکراسی، فرەیی، رەنگاو رەنگ وەك یەکێ لەئاستی یاسا.
- خوارووی ئەفریقیا تەنیا یەك دەوڵەت بێ.
- کەسێك تەنیا یەك دەنگی هەبێت.
لە ماوەی دوو ساڵی دانوستاندن، پێشێلی زۆر روویدا لەکوشتنو گرتن، تا گەیشتە ئەوەی لە مانگی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٢) کوشتو کوشتارێکی زۆر کرا، کە بووە هۆی راگرتنی دانوستاندن، هاوکات خۆپێشاندنو مانگرتن دەستی پێکرد، کە ئەمە گفتوگۆی گواستەوە بۆ قۆناغێکی تر، لەساڵی ١٩٩٤ گفتوگۆ دەستی پێکردەوە.
جیاوازی هەبوو لەنێوان ANC وحکومەت، لەسەر مەسەلەی هەڵبژاردنو راپرسی بۆ دەستوور... ANC رایان وابوو هەڵبژاردن پێش راپرسی دەستوور ئەنجام بدرێ هەرچی حکومەتی دی کلێرك بوو، رایان وابوو راپرسی دەستوور پێش هەڵبژاردن بێ، دیارە ئەمەیان بۆ ئەوە بوو چونکە دەستوور دەبێ بەگەرەنتی بۆ ئەوان.

* بۆ رێگە گرتن لە کێشەکان:
١. قۆناغی یەکەم: هەموو حیزبو دەسەڵاتەکانی بەشدار لە گفتوگۆ، حەقی ڤیتۆیان هەبوو، لەسەر بابەتە بنەرەتییەکان لەساڵی ١٩٩٤ دەستووری کاتییان دانا.
٢. قۆناغی دووەم: هەڵبژاردنی پەرلەمان، پێکهێنانی حکومەت لیژنەی رەشنوسی دەستوور (ئەوەی لەعێراق کرا، لە ئەنجومەنی دەسەڵات، بۆ حکومەتی کاتی (یەك)، هەڵبژاردنو پەرلەمانو حکومەتی کاتی دوو ئامادەکردنی رەشنوسی دەستوور - زۆر لەوەی ئەوان دەچوو)!.

- لە ساڵی ١٩٩٦ راپرسی بۆ دەستووری خوارووی ئەفریقیا کرا، کە ئەوە زەمانەتێکی گەورە بوو بۆ هەمووان، لەدەوڵەتێکی فرە ئاینو رەنگو رەگەزو تیرەو مەزهەبی وەك خوارووی ئەفریقیا.
- دادگای دەستووری دروست کرا.
بەو شێوەیە دوای چوار ساڵ برواو متمانە بەیەك دروست بوو لەنێوان لایەنە جیاجیاکان، بۆ قبوڵ بوونەوەی ئەم برواو متمانە بۆ ناو گەلی خوارووی ئەفریقیا چی کرا؟

کاتێ نیلسۆن ماندێلا بەزۆرینەی دەنگ هەڵبژاردنو دەسەڵاتی خوارووی ئەفریقیای بردەوە، لایەنەکانی تری سیاسی، بەسپیەکانیشەوە پەراوێز نەکرد، تەنانەت ماندێلا تەکلیفی لە سەرۆك کۆمار دی کلێرك کرد کە بەشداری بکات لەو دەسەڵاتە. بۆ دڵنیایی کردنی زیاتر سپیەکان دەسەڵاتیان دا بەو کەسانەی کە پێشتر لەدەسەڵات بوون لەسوپاو پۆلیس ماوەیەکی زیاتریان پێدان لەدەسەڵات بمێنن، بەو شێوەیە بۆ دوژمنە کۆنەکان دنیایان سەلماند کە بروایان بەدیموکراسیەتو پێکەوە ژیان هەیە، بروایان بەلێخۆشبوون هەیە.
ئەم هەڵوێستەی (ANC)و ماندێلا زەمانەتێکی گەورە بوو بۆ هەموولایەك، بەتایبەتی سپییەکان.
- بۆ مەبەستی قوولکردنەوەی هوشیاریی لەسەر گرنگی ئاشتیو دانوستاندنو پێکهاتنو عەدالەت، بەبەردەوامی ناوەرۆکی کۆبوونەوەکانی دانو ستاندنیان بڵاودەکردەوە بۆ جەماوەر، لەرێگای کەناڵەکانی راگەیاندن.
- هەروەها حیزبو رێکخراوە سیاسیو نا حکومییەکان رۆڵی چاکیان دەگێرا لەسەر بەئاگا هێنانەوەی جەماوەر لەگرنگیی ئاشتیو دانو ستاندن لەرێکەوتنو عەدالەت لەژیانی هەر تاکێکی کۆمەڵو وڵات.

*** بە کورتی:**

بەدەستهێنانی ئازادیی، دیموکراسی، عەدالەتو پێشکەوتن لەهەموو بوارەکانی ژیان بەری ئەو بیرو کردارەیە، کە هەڵقوڵاوی ئەو شارستانیەتەیە، کە ئەوان هەیانەو لەسەری دەڕۆن.

ئەوەی دروست بووە بەری پەروەردەی ئایینیو فیکریو سیاسیو کۆمەڵایەتی ئەوانە، بەری بیری پاكو سیاسەتی راستو دروستو راستگۆییو سەراحەتو دڵ گەورەییو لێبوردەی سەرکردایەتی ئەو گەلە مەزنەیە.

تایبەتمەندی ئەوان رێزگرتنو گوێگرتنو تەقدیر کردنە بۆ بیروڕای بەرانبەرو دان پێدانان بەمافە رەواکانیان. تایبەتمەندی تر، ئەوەیە، ئەوان گەلێکی دڵ گەورەو موسامیحن لەئاستی یەکتر. گەلانی خوارووی ئەفریقیا کەمیان بەسەر نەهات، بە رەشو سپیو رەنگەکانی تر، لە کوشتنو ماڵوێرانیو دەربەدەری، بەڵام ژیرانە هەموو ئەوانەیان کرد بەقوربانی ئایندەی گەلانی خوارووی ئەفریقیا، لەسەر بنچینەی راستییو رێکەوتنو عەدالەت. ئەوان دەرچوو سەرکەوتووبوون لەخوێندنەوەو شرۆڤەکردنی رابردوو ئایندەش.

*** گەر خۆمان بەراورد بکەین لەگەڵ ئەوان، خۆمان بەم شێوەیە دەبینین:**

هەڵسوکەوتی ئێمە، کاردانەوەمان، رەنگدانەوەی بیرو بۆچوونمانە، کە ئەویش سەرچاوە لەپەروەردەی ئایینی، فیکری سیاسیی، کۆمەڵایەتی وەردەگرێت.

ئێمە لەناوچەیەك دەژین، ئەم ناوچەیە لەدێر زەمانەوە ناوەندی توندو تیژیی بووە، هەمیشە مەیدانی ململانێو زۆرانبازیی زل هێزەکان بووە، لەپێناو داگیرکردنو سەپاندنی بیرو دەسەڵاتی سیاسیی.هەموو جاریش شەڕو ململانێیەکە لەهی پێشوو قورسترو توندتر بووە.

هەتا ئێستا عەقلییەتی زاڵی ناوچەکە داگیرکردنو پاوەن کردنە لەجیاتی لێبوردنو بەخشینو دان پێدانان بەمافەکانی بەرانبەر. تێکدانو وێران کردن، لەجیاتی ئاوەدانکردنەوەو بوژانەوە، سەیرکردنی بەرانبەر بەکەمیو سووکی، لە جیاتی رێزو تەقدیرە، پشتگوێ خستنو پەراوێزکردن، لەجیاتی گوێگرتنو گرنگی دانە بەبەرانبەر، تۆڵە سەندنەوە لەجیاتی لێبوردنو بەخشین.

بێگومان موهیمەی ئێمە قورسترو زەحمەتترە چونکە کارەساتو ماڵوێرانی ئێمە لەخەڵکی خوارووی ئەفریقیا زیاترو برینەکانیشمان لەهی ئەوان قووڵترە بەپێی تەقدیر، جگە لەمەش کەلتوری رۆشنبیرییان وای کردووە کە ئەوان هەم تەقدیری بەرانبەر بکەن (هی دوژمن)و دڵ گەورەییو موسامحترن لەگەڵ بەرانبەر.

*** کورتەی دەرسو پەندەکان:**

کورتەی دەرسو پەندەکان ئەوەیە، ئێمە جیاوازیمان لەگەڵ ئەوان هەیە، تایبەتمەندی خۆمان هەیە، دەکرێ لایەنە چاكو لێکچووەکانی هەموو لایەك وەربگرین، بەپێ تایبەتمەندی کلتوری خۆمان لایەنی بەهێز سوودی لێ وەربگرین.

مێژووی ململانێ لەم ناوچەیە، ئەوەبووە، لایەنی بەهێز ناتخوێنێتەوەو لێتێتناگات، بڕوای بەدانوستاندن نیە، بەهۆی کورت بینیو دەرمارگیری نەتەوەییو مەزهەبی. بەهۆی حەزیان بۆ داگیرکردنو پاوان کردن.

لەلایەکی تریش، هەر ئەو عەقلییەتو کلتورە وای کردوە کە لێبوردنمان وەك پێویست نەبێت لەئاستی بەرانبەر. کلتوری ناوچەکە لەرووی تۆڵەوە، زاڵە بەسەر عەقلیەتو هەستەکانی تری مرۆڤایەتی، لێخۆشبونو لێبوردن زۆر کەمە.

*** کۆتایی هەڵوێست:**

١. هەموو لێپرسراوانی حکومەت بەتایبەتی سەرۆکی دەوڵەت (Thambo Mbeki)و رێکخراوەکان نیگەرانن بەوەزعی عێراق کە لەبارێکی نائاسایدا تێدەپەڕێ هاو سۆزی تەواوی خۆیان نیشاندا بۆ ئەوە.

٢-نیگەرانن لەوەی وەك پێویست ئاگایان لەوەزعی عێراق نییە، زانیاری رۆژانەیان نییە، داوایان کرد، کە کارێکی وا بکەن زانیاری رۆژانە هەبێ...

٣- بەڵێنی ئەوەیان دا، کە هاوکاری عێراق بکەن بەپێی تواناو لەهەموو روویەکەوە...

لەکۆتاییدا، ماوەتەوە ئەوە بڵێم:

سوپاسی هەموو ئەوانە دەکەین، کە ئەم بابەتانەیان بۆ باس کردین، لەراو بۆچوونی خۆیان ئاگاداریان کردین، لەلێپرسراوی دەوڵەتو حکومەتو مامۆستایانی زانکۆو هەردوو رێکخراوی (الحقیقة والمصالحة)و سەنتەری ئەفریقیا بۆ چارەسەر کردنی نیزاع بەتایبەتی بەرێز سەرۆك کۆمار ثامبو بیکیی کە بەرێزی پێشوازی لێکردینو بەتەقدیری زۆرەوە بەرێی کردین لەهەرێمی کوازۆلو – ناتالو دادگای دەستووریو وەزارەتی (Dezmund Tutu) کە بەراستی ئامۆژگاری چاکی کردین. هەروەها جارێکی تریش سوپاسی زۆری بەرێز پرۆفیسیۆر نیکۆلاس (فنك) هایسمی Nicholas (FINK) Hysom.و دەستەکەی UN دەکەین، کە بەراستی پێمانەوە ماندوو بوون.

### * کلامی ئەهلی پەرتوك بۆ چارەی کێشەی کەرکوك:

ستران عەبدوڵلا، یوسف گۆران، زاهیر شکور، عارف قوربانی

*** پێشەکی:**

ئامانجی ئێمە لەم باسە ئەوە نییە مێژووی سیاسیی یان شیکارییەکی گەشبینانە لەسەر کەرکوك بکەین یان بە دیوێکی تردا، لەباسێکی کوردی وبەزمانی شیرینی کوردی پێ لەسەر سەلماندنی کوردستانییەی کەرکوك دابگرین، چونکە ئەوە بۆ هەموو کوردێك بەشێکە لە عەقیدە وبیروباوەڕو ئێمەش نامانەوێ گومان بخەینە سەر بیروباوەڕێکی وا کە لەم شەرە چارەنووسسازەدا ووزەی مەعنەویو ئەنگێزەی ڕەوایی بە تێکۆشانی میللەتەکەمان دەبەخشێ.

بە دەستنیشانکردنی کەمو کوری ورەخنەگرتن لێیان مەبەستمان ئەوە نییە دەسکەوتو حاڵەتە ئیجابییەکان نادیدە بگرین. بەڵکو بانگەوازی ئێمە بۆ بەفیڕۆنەدانی ئارەق و خوێنو فرمێسکی لە مێژینەی گەلەکەمانو پێشمەرگەکانی نەبەردیی جەنگو سیاسەت ودانوستاندنەکانی شۆڕشەکانی کوردستانە.

ئامادەکارانی ئەم بابەتە خۆیان بەئەندامێکی ئاسایی ئەو بزووتنەوە پانوبەرینەی کوردایەتی دەزانن کە چەند دەیەیەکە شەڕ لەسەر کەرکوك ودیاریکردنی سنووری کوردستان دەکات، لەهەمان کاتیشدا ئەرکی ڕووناکبیریی و سیاسیی ئەویان بەسەردا دەسەپێنێ کە بەچاوێکی ڕەخنەگرانەوە سەیری ڕەوشی کەرکوكو ئەدائی سیاسیی هێزەکانی کوردایەتی بکەن.

هەوڵەکانی هەموو لایەك بۆ ئەوەیە کەرکوك لەدەست نەچێت. ئێمە پێمان وایە هەموو بابەتە ئاڵۆزو گرنگەکانی وەکو کەرکوك، بۆ تێپەڕاندنیان، پێویستییان بە دەستپێشخەری هەیە، بەدیالۆكو فراوانکردنی ئاسۆی بیرکردنەوە هەیە. یانی پێویستیان بەو گوڵدانە هەیە کە ئێمە لەڕاسپاردەکاندا ناومان ناوە (سەبەتەی بیرۆکە لەبارەی کەرکوکەوە) پێمان وایە بزوتنەوەی سیاسیی چالاك ودەوڵەمەندی وەکو بزوتنەوەی کوردایەتی، کە لە سەد لاوە بە نەیارو دووژمن دەورەدراوە، پێویستی بەوەیە لە چەکمەجەی مێزی بەردەستیدا پتر لە سیناریۆیەکی چارەسەر هەڵبگرێتو چەند گرووپێك کاری چاودێریو بەدواداچوونی ئەو سیناریۆیانەی بۆ بکەن.

تاقیکردنەوەی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازیو تەجروبەی بەڕێوەبردنی دەوڵەت لە مەملەکەتە خواپێداوەکاندا دەریدەخات کە دواجار بیرۆکەو قسەی ڕەسمی سیاسەتمەدارو دەوڵەتداران مەحکومە بە هەلومەرجو سنووردارکراوە بە هاوسەنگی هێزو گەمەی سیاسییەوە کە دەبێ سیاسییەکان ڕەچاوی بکەن، بەڵام توژەر ونووسەرانو نێوەندەکانی باسو لێکۆڵینەوە دەرفەتێکی فراوانی بیرکردنەوەو دیراسکردنو ئاڵوگۆڕی ئەلتەرناتیفەکانیان بۆ لواوە کە بێ سانسۆر بیهێننە گۆڕێو دواجاریش بیخەنە بەردەم سیاسەتمەداران وئەوانیش گوڵبژێرێکی تێدا بکەن.

ئەمەی لێرە ئێمە کردوومانە چەند هێڵێکی گشتی ناتەواون، پێویستییان بە دەوڵەمەندکردن هەیە چ لەم سیمنارەی دەستەبژێرێکی هاوپەیوەند بەپرسی کەرکوکەوە بەشدارییان تێدا کردووەو چ لەو کاتەی وەك بابەتێکی گەڵاڵەکراو بڵاوی دەکەینەوە. ئەم ڕاسپاردانە هیچ بڕیارێکی پێشوەختیان تێدا نییە. بیروڕای چەند کوردێکە، کە لەگەڵ ڕەچاوکردنی بیروڕای تایبەتی خۆیان، باوەڕیان بەکاری دەستەجەمعی هەیە.

*** بەشی یەکەم:**
**- پێداچوونەوەیەکی گشتی:**

**یەکەم. پرەنسیپەکان:**

مەسەلەی کەرکوك کرۆکی مەسەلەی کوردستان پێکدێنێت، چونکە:

١. مەسەلەی خاكو سنوورە، خاکی مێژوویی کوردستانییانو سنووری ئەو قەوارە سیاسییەی مافە نەتەوەییەکانیانی تێدا پیادە دەکەن.

٢. تووشی سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی هاتووە (خەڵکەکەیو خاکەکەی دووچاری بەعەرەبکردن هاتوون) بۆ ئەوەی کورد قربکرێتو مودەعییەك بەسەر ئەو خاکەوە نەمێنێت.

٣. ئەندازەی داوای دیموکراسی کوردو داوای عێراقییەکانیش لە هەمان ئاستدایە، پرسی دیموکراتیزەکردنی عێراق تەنها داخوازی کورد نییەو هی ئەوانیشەو لەوەدا هیچ گرفتێکمان لەگەڵ یەکدیدا نییە. بەم مانایە کورد خەریکە گرفتی لەگەڵ عێراقییەکان نامێنێت، تەنها گرفتی کەرکوك نەبێت، بۆیە کەرکوك کرۆکی دوا مەسەلەو دوا ناکۆکی ئێمەیە لەگەڵ عێراقییەکان.

٤. کەرکوك بۆتە بەشێك لە یادەوەری نەتەوەییو کەرامەتی نیشتمانیی کوردستانییانو جەوهەری ململانێی کورد لەگەڵ بەغدا.

٥. لەم باسە، هەروەکو هەموو باسێکی کوردستانیی تر، کەرکوك ناونیشانی تەنها پارێزگایەك نییە، بەڵکو ناونیشانی هەموو ئەو ناوچە کوردستانیانەیە کە بەر سیاسەتی تەعریبو ڕاگواستن کەوتوون.

**دووەم: ململانێی کوردو بەغدا:**

ئەم هۆکارانە وایکردووە:

- چەند دەیەیەك لەشەڕی کوردستان دژی بەغدا، کەرکوك بکاتە ناونیشانی خۆیو هەموو دانوستاندنەکان، کوردو بەغدای پێوە گیرۆدەبێت.
- ئەدەبیاتی سیاسیی کوردایەتی جەخت بکاتە سەر مەسەلەی تەعریب، ڕاگوێزان، پاکتاوی ڕەگەزی وەك بابەتی سەرەکی تێکۆشانو بەرپەرچدانەوەی دووژمنان.

هەتا ڕووخانی ڕژێمی دیکتاتۆری، سروشتی ململانێی کورد لە بەغدا لە پرسی کەرکوکدا بریتی بووە لە:

١. دەرکردنی کورد، تەعریبکردنی کەرکوك. بەسیاسەتو بە ئیدارە، بە شەڕوشۆڕ کوشتنو بەسێدارە. بەفرتوفێڵو چەوتیو چەوێڵی، بە پارەو پولو بە یاساو هەیبەتی دەوڵەت،

بە حیزبو حكومەتو بریاری سەرزارەكیو نووسراوە.
٢. بەرپەرچدانەوەی ئەم سیاسەتە لەلایەن كوردەوە، بە شۆرشو چالاكی پێشمەرگانە، بە تەبلیغاتی سیاسیو میدیایی، بە ریسواكردنو ئیدانەكردن، بە تۆڵەسەندنەوە لە رەمزەكانی تەعریبو راگویزان بووە. لەشێنەییو سیاسەتیشدا، بە گفتوگۆو موفاوەزە لە ساڵانی (١٩٧٠-١٩٨٤) بووە كە ئەو موفاوەزاتانە ئاكامیان نەبووە بەعس توندترو كوردیش تۆڵەسێن بووە. بەعس راگویزانی زیاترو هەڵمەتی خاچ پەرستانەی تەعریبی لە دژمان جۆشداوە. ئەنفالی كردوویینو بە هەزارانی لێ كوشتوین. جارێكی تر لە موفاوەزاتی دوای راپەرینی ساڵی (١٩٩١)دا لەگەڵمان تێهەڵچۆتەوە، بەڵێنی بەخشینی كەركوكی داوە، ئینجا پەشیمان بۆتەوە. كورد لەرێی قەوارەی سیاسیی خۆیەوە: بزوتنەوەی تەعریبی لە دوو ئاستو بەپێی تواناى بەردەستی، تا رادەیەكیش بە كەموكورییەوە ئەنجامداوە.
أ. ریسواكردنی تەعریبو كۆكردنەوەی دەنگی نارەزایی لە ئاستی جیهانیدا، تێگەیاندنی ئەمریكاو ئەوروپاو نەتەوە یەكگرتووەكان لە قەبارەی ئەو تراژیدیایە.
ب - پێشوازیكردن لە ئاوارەو راگوێزراوەكانی سیاسەتی تەعریبو راگواستنو دابینكردنی كەرەستە سەرەتاییەكان. ئەم دۆخە لە هەڵكشانو داكشاندا بووە چونكە بەعس سەرەرای گەمارۆدانو وەزعی شری، بەڵام تەرحیلی تا دوا رۆژی رووخانی درێژەپێداو لەسەری بەردەوام بوو.

**سێیەم: كەركوك لەدوای ٤/١٠:**

دەرفەتی راستەقینە بۆ چارەسەری مەسەلەی كەركوك لەدوای رووخانی رژێمی سەددامەوە دەستپێكرد، چونكە لە دوای رووخانی ئەو رژێمەوە ئیتر لەسەر ئەرزی واقیع:
- هێزی وزەبەخشی تەعریبو راگوێزان لە ئاستی لۆكاڵیو لە ئاستی سەرتاسەری عێراقدا پەكی كەوت. حكومەتێك نەما لە عێراق نەك بۆ كەركوك بەڵكو تەنانەت بۆ بەرێوەبردنی عێراقیش. نەك بۆ تەعریبو راگوێزان، بەڵكو بۆ ئەوەش كورد رووی تێبكاتو داوای هەڵوەشانەوەی ئەو بریارو یاساو راسپاردانەی لێ بكات كە كەركوكیان بەو دەردە برد.
بەم شێوەیە لە (١٠)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٣)دا، رۆژی كەوتنی پەیكەری سەددام لە ناوجەرگەی شاری كەركوك كە بەجلو عەگالی عەرەبەوە رەمزێك بوو بۆ تەعریب، تا رۆژی پێكهاتنی یەكەمین حكومەتی عێراق لە مایسی ساڵی (٢٠٠٤) دا، ساڵێكی تەواو كورد لە گێژاوێكی سەیری سیاسییدا بوو. لەلایەك هەموو شتێكی تەعریب راوەستاوەو ئەو حكومەتەی تەعریبی دەكرد نەماوە، لەلایەكی تریشەوە حكومەتێك نییە تا كورد داوای پێدانەوەی كەركوك، هەڵوەشانەوەی تەعریبو راگوێزانو هەموو ئەو بریارو راسپاردانەی دەوڵەتی بەعسی لێ بكات كە بۆ شێوانی باری دیموگرافی شارەكە دەریكردبوون.
هەر كەسێك پێداچوونەوەیەكی بەویژدانانە بۆ ئەو سەردەمەی سەرەتای رووخانی رژێم بكات لە كەركوك دەزانێت سەرەرای بوونی هێزی سەربازی ئەمریكا، بەڵام كورد بایی ئەوەندە تواناو دەسەڵاتی هەبوو كە زۆر زوڵمو زۆری تەعریب بەهێزی شۆرشگێریی هەڵبوەشێنێتەوە. بەپێی ستراتیژو بزاوتێكی مەحكەم كۆنترۆڵی شارەكە بكاتو لێنەگەری تەعریبكاران بەناوی جیاجیاوە بێنەوە گۆرەپانی كاریگەری كەركوك. بەرای ئێمە چەند فاكتەرێك هەبوون كاری لە دەستپێشخەری سیاسیی كورد كردو چارەسەری رادیكاڵی پەكخست:
١. تاڵانو پەلاماردانی شوێنو دەزگا گشتییەكان لەژێر پەردەی تۆڵەسەندنەوە لە رژێمی بەعسو بۆ تەماعی شەخسی دوور لە ئەجیندای سیاسیی، هەم كوردی بە دەسكەوتی كاتیی (غەنیمەی شەر)و لاوەكییەوە سەرقاڵكردو هەمیش وێنەی كوردی شێوان لای نەتەوەكانی كەركوك. بەتایبەتی لای خەڵكی ئارامیخوازو كاسبكاری توركمانو تەنانەت لای ئەو كوردانەی شارەكە كە لە ژێر زوڵمی بەعسدا چاوەرێی رۆژی رزگاری بوون، ئەم دۆخە لەیادەوەری نەتەوەكانی كەركوكدا ماوەو دەبێ بێ پەردە بڵێین كاریگەری لەسەر ئەو هەوڵە دڵسۆزە كەمانەش داناوە كە بۆ نزیكبوونەوەو لێكتێگەیشتن لەگەڵیان دەدرێت.
٢. سیاسەتی توندرەوانی بەرەی توركمانیو بوختانەكانی میدیای توركیاو میدیای عەرەبی كە بوونە باعیسی هەڵایسانی قینی كورد لەسەردەمێكدا كورد تازە زوڵمو زۆری لەسەرخۆی رادەماڵیو خۆی بە غەدرلێكراو دەزانی. ئەمانەش بەشێك لە هەڵسوكەوتی كوردی خستە قاڵبی كارو كاردانەوە لەجێی (دەستپێشخەری)و (سیاسەتی ژیرانە) بۆ پۆلینكردنی توركمانو كلدو ئاشوورو عەرەبی رەسەن لەوانەی بۆ تەعریب هاتوون. لە هەندێك شوێندا كورد خاووخلیچكو نەرم بوو كە دەبوایە توندوتۆڵ بێتو لە هەندێك حاڵەتی تردا زبرو توندرتیژ بوو كە دەبوایە نەرمو نیانو میهرەبان بێت.
٣. سیاسەتی شلەژاوی هاوبەشی كوردو هاوپەیمانەكانی. هاوپەیمانەكان جارێك كوردیان هاندەدا كەركوك بە ئاراستەی كردنی بەشێك لە هەرێم باژۆن، جارێكی تر هانی كوردیان دەدا لە چوارچێوەی كەركوكێكی عێراقیدا هەوڵبدەن بەش بۆ كورد دابین بكەن. ئەم ئاراستەیە لەو كاتانە بەهێزتر بوو كە مۆدێلی فیدراڵی پارێزگاكان سەریهەڵدا. تەنانەت ئیدارەی كەركوك بەو شێوەیە دارێژرا كە ببێتە حكومەتی كەركوكو تا ئێستاش ئەو ئازناوە لە هەندێك ئەدەبیاتی هێزەكانی كەركوكدا باوی ماوە.
بەمجۆرە وردەوردە كورد لە كەركوك دەسەڵاتی دیفاكتۆی پەیدا كرد. ئەمریكاو هاوپەیمانەكانی لە ئامانجی دژە تیرۆرو راماڵینی بەعسدا بەواقیعی دۆستی كوردبوون، بەڵام لەمەسەلە سیاسییەكەدا كە پەیوەندی بە چارەنووسو ناسنامەی شارەكەوە بوو كوردیان وەك گیسكەكەی هەیاس لێكرد. نەهێشتیان زۆر قەڵەو بێت لایەنەكانی تر بوروژێنێتو نەهێشتیان زۆر لاوازبێت بە جۆرێك تیرۆریستان هار بن، بەڵام چونكە بەرنامەی كورد لەگەڵ رەوتی رووداوەكان دەگونجا، سەرەنجام هاوپەیمانەكان لە كورد زیاتریان چنگ نەكەوت متمانەی پێبكەن. ئەمەش یەكێتی بەرژەوندییەكانی لێكەوتەوە. (هەر چەندە كەسانی ئیستعماریو ئۆیینبازی

وەکو پۆل هارڤ ویستیان لە کوردی تێکبدەن)، بۆیە یەکەم پارێزگاری کەرکوکی دوای ڕزگاری کورد بوو، کورد لە ئیدارەی مەدەنی و دەزگاکانیی سەربازیو ئەمنیدا دەستی باڵای پەیداکرد چونکە بەشی بەرچاوی عەرەب لە هاوکاری سەربازیو ئەمنی هاوپەیمانان دوور کەوتنەوەو بەشەکەی ترشیان بوونە هاوسەنگەری تیرۆریستان لە ئاستی کەرکوكو عێراقدا.

تورکمان بوونە دوو بەشەوە: نوخبەیەکیان لەگەڵ بەرەی تورکمان کەوتنو نوخبەیەکیان بوونە هاوپەیمانی کوردو زۆرینەش چاوەڕێن. بەڵام بە گشتی لە بواری ئیدارەدا مانەوەو لە ئاستی تریشدا چوونەوە ناو چوارگۆشەی موحافەزەکارییەوە.

ئەم واقیعە وایکرد کورد وەکو (حاکمی کەرکوك) هەموو گیروگرفتەکانی حوکمڕانی ڕوو بەڕوو ببێتەوە بەبێ ئەوەی بنکەیەکی فراوانی فەرمانبەریی لە یەکە ئیدارییەکان هەبێت، بودجەی پێویستی لە بەردەست بێت، دەسەڵاتی هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکانی تەعریبو لالێکردنەوەی ڕاگوێزراوانی هەبێت. ئەم گرفتە دوو سەرە بوو:

– لەلایەك کورد سەری دامودەزگاکانی بەدەستەوە گرتو ئەمەش ڕەخنەی نەتەوەکانی تری لێکەوتەوە.

– لەلایەکی تریشەوە بنکەی بەرینی فەرمانبەران هەر ئەو بنکەیە بوون کە لەسەردەمی ڕژێمی بەعسدا هەبوون، بەغدا فەرمانبەری کوردی دانەدەمەزراند، ئەوانەی لە هەرێمی ڕزگاریشەوە گەڕانەوە موچەکەیان هەر لە هەرێمەوە دەهات، دەوامیان لە ئیدارەکاندا بەکاتی مایەوە (ئێستاش هەروایە) بۆیە نەبوونە بەشێك لە جەستەی ئیدارەی کەرکوك. وورده وورده بەغدا لەڕێی ئیدارەو پارەوە گوشاری دەخستە سەر کەرکوكو کەرکوکیش لەڕێی دەسەڵاتی دیفاکتۆوە سیاسەتەکانی بەغدای بەربەست دەکرد.

بێگومان لەم نێوانەشدا هەڵەی ئیداریی کوردو سیاسەتی حزبایەتی تەسك دەبوونە ئاڵۆزییەکی سەرباری ئاڵۆزییەکانی دیکەی کەرکوك.

**چوارەم: کەرکوك لە سەردەمی مەجلیسی حوکمدا:**

لە سەرەتای حوکمی مەجلیسی حوکمدا کە لە هەموو پارێزگایەك ئیدارەیەکی مەدەنی هەبوو، دۆخەکە مەیی بوو. لەم هەلومەرجەدا کە (حکومەتێکی تەواو) لە عێراقدا نەبوو داخوازییەکانی ڕووبەڕوو بکرێتەوە، کورد بە دوو شێواز کەوتە (شەڕ)ی داواکردنەوەی کەرکوکەوە:

شێوازی یەکەم، گوشار لەناوخۆی کەرکوكو شێوازی دووەم لە ئاستی سەرکردایەتی عێراقو هاوپەیمانەکان.

لە دانیشتنەکانی ئەنجومەنی حوکم: کەلە چەند دانیشتنێکدا داوای کەرکوكو ناوچەکانی تەعریبکراو کرایەوە. ئەم داوایە ڕووبەڕووی چەند گرفتێك بۆوە.

١. حکومەتی عێراقی حکومەتێکی (جەماعی) بوو، دەسەڵاتی عەرەب تێیدا لەهی کورد زۆرتر نەبوو. دەسەڵاتی هەموو ئەندامەکانی بەلایەكو هی پۆڵ بریمەر بەلایەکی تر.

٢. حکومەتێکی ٢٥ کەسی بوو کە هەریەکەیان سەرکۆمارێك بوو بۆ خۆی، پرۆسەی بڕیاردان پەکی کەوتبوو، کە بڕیار دەردەچوو بریمەر پێوەی پابەند نەدەبوو. کە ئەو ڕازی دەبوو جیهازی دەوڵەت بوونی نەمابوو جێبەجێی بکات.

٣. کورد بۆ یەکەمین جار بەرەو ڕووی حکومەتێك بۆوە کە بڕیاری پێنادرێت، پرۆسەی گەڵاڵەکردنی بڕیار تێیدا زەحمەتە، وەکو (زەمانی حوکمی ـبەعس)! نییە ئەگەر سەدام ئارەزووی لێ بوایە دەیتوانی بە ئیمزایەك کەرکوك بخاتە سەر کوردستان. حاڵی وا بۆ کەرکووك زۆر مەسەلەی دیکەی کوردایەتی دەبێتە دەرفەتی کارکردنو لە هەمان کاتدا زەحمەتیمان بۆ دروست دەکات. ئەمەش بۆ کەرکوكو مەسەلەکانی دیکەی کوردایەتی دەبێتە وانەیەکی سەرنجراکێشو ئەزموونی لێ فێربوونی بەدواوەیە. وانەی ئەوەی دیموکراسی و فرەیی دەزگایەکی ئاڵۆزی دروستکردنی بڕیارەو بە ئاسانی خۆی نادا بەدەستەوە بە پێچەوانەی دیکتاتۆری کە کلیلی چارەسەر لەدەست یەك کەسدایە. بێگومان نموونە دیموکراسییەکە دەرفەتی چارەسەری زیاتر دەدا، بەڵام بەپشوو درێژیو کۆششێکی چاكو ووردەوە.

٤. حکومەتی (ئەنجومەنی حوکم) ئەولەویاتی زۆری لە پێش بوو کە گرنگترینیان بەدەست هێنانی سەروەری بوو بۆ خۆیان، ئینجا بۆ عێراقییەکان.

٥. ئەم حکومەتە حکومەتێکی بێ یادەوەری بوو لە مامەڵەکردن لەگەڵ مەسەلەی کوردو کەرکوکدا. تێزی بیرکردنەوەی ئەندامە عەرەبەکانی تێزی عێراقێکی بێ زوڵمو زۆری سەددام بوو، ئەندامەکانی لە فیدراڵی دوودڵ بوون چ جای لە کوردستانێك بە تەواوی خاکەکەیەوە. بەشی زۆری ئەندامەکانی مەجلیسی حوکم خۆیان لە قوربانییەکانی دەست سەددام بوونو پێویستیان بەوە بوو کەسێك ئینسافیان بکاتو مافیان بۆ بگرێتەوە. ئەوانیش وەکو کورد مودەعی بوون بەسەر حکومەتی پێشووەوە، زوڵم لێکراوبوون، بەڵام پاشماوەی بیری شۆڤێنیزمیان تێدا بوو. وا لە زوڵم لێکراوی کورد لە کەرکوك تێدەگەیشتن کە هیچ جیاوازییەکی نییە لەو زوڵمەی لە شیعە، یان لە سوننەو تێکرای عێراقییەکان کراوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت بڵێین قۆناغی ئەنجومەنی حوکم دوو دەرفەتی دایە کورد:

– لە ئاستی عێراقدا دەرفەتیدا جارێکی تر عەرەب لەگەڵ باسی کەرکوکدا فۆرمات بکرێنەوە ڕەهەندەکانی ئەو کێشەیە بزانن و ناچار بن لەگەڵ سەرکردایەتی کورددا بیر لە چارەسەرێك بکەنەوە بۆی.

– لە ئاستی کەرکوکدا بێ دەستوەردان وورده وورده کورد بتوانێت شوێن پێی ڕەوای خۆی قایم بکاتەوە.

٦. لەلایەن ئەنجومەنی حوکمەوە کۆمەڵێك بڕیار دەرچوون لەسەر ڕاگوێزراوان، لەسەر فەسڵکراوان لەئەركو وەزیفە ولەسەر خانووی حیجزکراو وداگیرکراو، ئەو بڕیارانە بۆ عێراق هەمووی بوو، بەڵام کوردی کەرکوكو تەعریبیشی دەگرتەوە و بۆ کەڵکی ئێمەش بوو.

لەبەر ئەوەیە کۆششی کوردی لەسەردەمی ئەنجومەنی حوکمدا خۆی لەسێ هەوڵ نواند:

١. لەبەغدا داوای گەرانەوەی کەرکوك بکات وهەرەشەی مانگرتنی مەدەنی بکات ولە کەرکوکیش خۆپیشاندانی جەماوەری فراوان بکات کە بۆ ڕۆژی دواتر عەرەبی تەعریب وتورکمانەکانی بەرەی تورکمانی لە ساحەی ئیحتفالاتی کەرکوك بە خۆپیشاندانێکی بچووك، بەلاّم مانادار وەلاّمیان دایەوە.

٢. وەفدی خانەقین بچێتە بەغدا وئیمزای خانەقینییەکانی ببات، لە گفتوگۆکاندا گوترا وەرگرتنەوەی مەخموورو خانەقین ئاسانە، بەلاّم باشتر وایە کورد هەموو ناوچەکان پێکەوە وەربگرێتەوە بیرکردنەوەی سەرکردایەتی کوردستان لەو بارودۆخەدا وابوو کە هەموو ناوچەکان پێکەوە وەربگرێنەوە. ئەم دەرکەوتە سەرەنجام بووە مایەی دیاریکردنی سنووری هەرێمی کوردستان لە قانوونی ئیدارەی دەولەت و دەستووری هەمیشەییدا بەو ناوچانەی تا ڕۆژی (١٩)ی ئاداری سالی (٢٠٠٣) لەژێر دەسەلاّتی ئیدارەی کوردستاندا بوون. لەگەل سەلماندنی ئەوەی کەرکوك و ئەو ناوچانەی تر. ناوچەی جێی ململانێن و بەگوێرەی ئەحکامە ئینتقالییەکان، ماددەی ٥٨و ئینجا ماددەی ١٤٠، چارەنووسیان دیاری دەکرێت. لەراستیدا دەستبەردار بوون لەو (کەمەی) دەکرا بەدەست بێت لەپێناو دەستگیرکردنی (هەموو) ئەوەی دەمانەوێت سیاسەتێکی دروست نییە لە دونیای دانوستاندندا. کورد دەیتوانی خانەقین و مەخمور وەربگرێتەوە و ئێستا کۆششی خۆی لە مەسەلەی کەرکوك وجێگاکانی تردا چڕبکاتەوە.

٣. مام جەلال لە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنەی حوکم مورافەعەیەکی کرد لەسەر نەخشەی کوردستان و سنوورە جوگرافییەکەی کە جگە لە کەرکوك تا زنجیرە چیای حەمرین شۆڕ دەبێتەوە.

ئەم بارودۆخە وایکرد عەرەبەکان بگەنە ئەو ڕاستییەی کە بێ کەرکوك ناتوانن هیچ فۆرمێکی ڕێکەوتن لەگەل کورددا بۆ چارەسەری وەزعی عێراق و وەرگرتنەوەی سەروەری گەلاّلە بکەن. لێرەوە ماددەی پەنجاوهەشت لە قانونی ئیدارەی دەولەت هاتەکایەوە کە گوزارشتی لە چەند پەرەسەندنێکی تازە دەکرد لەپرسی کەرکوکدا.

**پێنجەم: ماددەی ( ٥٨ ) زادەی چی هەلومەرجێك بوو؟**

١. عەرەبەکان دەیانوت ئێمە هەلبژێردراوی خەلك نین، بۆیە ناتوانین بڕیار لە چارەنووسی کەرکوك بدەین و بتاندەینێ.

٢. دەیانوت خەلکی دیکەش مودەعین بەسەر کەرکوکەوەو وەکو کورد بەلگەو قسەیان هەیە. بۆیە باشتر وایە خەلکەکەی بڕیار لە چارەنووسی بدەن.

٣. کورد لەسەر ئەرزی واقیعی کەرکوك زالبوو، بەلاّم دەریچەیەکی یاسایی نەبوو کە بیخاتەوە سەر کوردستان.

٤. ناکۆکی لەسەر ئەوە بوو کێ دەنگ لەسەر کەرکوك بدات؟ کێ خەلکی ڕەسەنی کەرکوکە؟ عەرەبی هاوردە یان کوردی ڕاگوێزراو؟

کێ لە کەرکوکە:

- کورد بە (دانیشتوو و ئاوارەوە).
- عەرەبی شیعەو سوننەی (تەعریب).
- تورکمان بە دوو تایفەی شیعەو سوننەوە.
- کلدۆ ئاشوور.

بێگومان ئەم واقیعە ئەو پێویستییەی هێنایە پێشەوە کە کورد بۆ هەر چارەسەرو تەگبیرێك دەبێ لەگەل ئەوانی تردا هاوپەیمانێتی بکات.

٥. هەموو ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی مادام کەرکوك شێواوە پێش پرسکردن بەرای خەلك پێویستە ئاساییکردنەوە هەبێت و باری شێواوی کەرکوك نەمێنێ و ئامادەی ئامارو ڕاپرسی بێت. بێگومان گەرانەوە بۆ پرسکردن بەرای خەلك لە ڕوالەتدا بەپەنابردنێکی دیموکراسی لەقەلەم دەدرێت. بەلاّم لەراستیدا پرسکردن بە دانیشتووان تاکە ڕێی ناسینەوەی ناسنامەی سەرزەمین و نیشتمانەکان نییە. بەلکو یەکێکە لە ڕێگەکان. پێویستی گەرانەوەی کوردی ڕاگوێزراوو گێرانەوەی عەرەبی هاوردە بەشێکە لە ئالیەتی ئاساییکردنەوەی کەرکوك بە پێی ماددەی (١٤٠) لە دەستووردا، بەلاّم ئەو ئالیەتە چونکە مامەلەکردنە لەگەل مرۆڤەکان، ئالیەتێکی بێ گیروگرفت نەبوەوەو نییە:

١. ئاوارەکان بەشپرزەیی و لە هەلپەی تانەلێدانی ئەوەی دەبێ بەزوویی بگەرێنەوە بۆ ئەوەی ئەو پرسە نەتەوەییە لەبارنەچێت، لە دۆخێکی زۆر خراپ و نائینسانیدا گەرانەوە کە کەمترین پێویستی ئینسانی و ژیانی شایستەی مرۆڤی ئەم سەردەمەی تێدا ڕەچاونەکراوە. بەمجۆرە نیشتەجێ بوون لەسەربازگە ڕووخاوەکانی ڕژێمی پێشووو لە یاریگاو دامەزراوە ساردو سڕو لەکارکەوتووەکانی دەولەتی ڕووخاو، نسیبی بەشی زۆری ئەو ئاوارانەبوو کە سالاّنێك ئاوارەی بێ دەرەتانی ولاّتی خۆیان بوون و دوای گەرانەوەش بوونە ئاوارەی شارەکەی خۆیان. دەستەیەکی کەمی موستەفیدی هەموو زەمان و زەمینێك نەبێت ئەگینا بەشی زۆری ئاوارەی گەراوە بێ توانا و دەرامەتێکی ئەوتۆبوون کە بتوانن خۆیان (ئیعادەی تەئهیل) بکەنەوە. نە ئیتر توانییان فەرمانبەرو کارگێری ئەو دامەزراوانەی هەرێم بن کە لێی دامەزرابوون و نە سەرکردایەتی کورد توانی بەرەسمی لە دەزگاکانی کەرکوکدا جێیان بکاتەوەو تەنها وەکو تەنسیب یان هەندێك جار بەچاو قایمی ئەرکی نەتەوەیی و خۆسەپاندن توانییان جێی خۆیان بکەنەوە. ئەنگێزەی نەتەوەیی و نیشتمانیی هۆکاری سەرەکی گەرانەوەی ئاوارەکان بوو، بۆیە توانییان دەستبەرداری (بەهەشتی ئارام و ئاوەدانی هەرێمی کوردستان) بن، بگەرێنەوە ناو دۆزەخی ئیرهاب و تەعریبی کەرکوك، ژیانی خۆیان و ئایندەی کێشەکان تەسلیمی سیاسەتی دەستی دەستی پێکردنی پۆل هارڤ و حەوالە بەگەوالەی حکومەتی عێراق بکەن.

ئەم دۆخە تازەیە وایکرد هەندێك جار وابێتە بەچاو کە کێشەی نەتەوەیی کەرکوك تەنها کێشەی کەرکوکییەکان خۆیان بێت لە کاتێکدا سەرەتاو بنەچەی کێشەکەو پەرەسەندنەکانی لەمەودواش دەیسەلمێنێ کێشەی کەرکوك کێشەی هەمووو کوردستانیانەو بەلێ ئەرکی کەرکوکییەکان تێیدا چارەنووسسازە، بەلاّم تاکە بەرپرس نین لەدوا چارەنووسی، چونکە کەرکوك کە دەگەڕێتەوە بۆ هەمووان دەگەڕێتەوە.

لەناو ئەم پێشهاتە نوێیە کە مەسەلەی کەرکوکی کردە ئەرکی دەنگدەرانی کوردی کەرکوك، کەموکورتی لە ئاستی خزمەتگوزارییەکان گرفتێکی تر بوو. چونکە چاوەڕوانی خەڵك بۆ ئاوەدانی کە بەهۆی دیاری نەکردنی ناسنامەو ئینتیمای ئیداری شارەکە لەنێوان سێ حکومەتدا (حکومەتی بەغدا، حکومەتی هەولێرو حکومەتی سلێمانی پێش یەککگرتنەوەیان) پرۆسەی ئاوەدانکردنەوەیەکی رێکوپێك زۆر دواکەوتو تەنها لەچوارچێوەی یارمەتی و کۆمەکی کەمو پەرتو نادیاردا مایەوە، ئەمانە هەموویان بەتێکرایی بوونە باعیسی ئەوەی جگە لە ئەجیندای سیاسیی ئەجیندای ئاوەدانکردنەوەو پێشکەوتنیش ببێتە بەشێك لە گرفتی کەرکوك. ئەمە لەکاتێکدا چاوەڕێ دەکرا ئەو چەندین کۆنفرانسی و کۆنگرانەی کوردو ئەمریکاییەکان لە کەرکوك و سلێمانی و هەولێر بۆ ئاوەدانکردنەوەی شارەکە گرێیاندا یارمەتیدەری ئارامی و جێگیری و دابینکردنی گەشەکردن بێت بۆ ئەوەی گەشەکردنی شارەکە رێگای دوور مەوداش بۆ چارەسەری سیاسیی بدۆزێتەوە.

بەمجۆرە بینیمان دوای چەندین خۆپیشاندانی سیاسیی بۆ گەڕانەوەی کەرکوك و بۆ بەرزراگرتنی ئاڵای کوردستان لە دژی سیاسەتەکانی بەعەرەبکردن و سیاسەتی سەپاندنی (عێراقچێتی) کەرکوك لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە، لەناو جەرگەی گەڕەکە کوردنشینەکانەوە خۆپیشاندان و نارەزایی نا سیاسیی و لەپێناو خزمەتگوزاری بەرپابوو وەك ئاماژەیەك بۆ ئەوەی کەرکوك ئەگەر لەباری خزمەتەوە کاری بۆ نەکرێت دەشێ لە قودسی کوردستانەوە ببێتە غەززەی کوردستان، واتا ببێتە ناوچەیەکی لێقەوماو لەجێی ئەوەی ناوچەیەکی دەوڵەمەندبێت و خێروبێرەکەی بگەڕێتەوە بۆ کەرکوك کوردستان کاتێك ئاوێزانی یەکتری دەبنەوە.

٢. پرسکردن بەرای خەڵك ئەو مەسەلەی هێنایە پێشەوە کە چۆن هەموو عەرەب بەرەسەن و تەعریبەوە دەنگ بۆ ئایندەی کەرکوك بدەن؟ بۆیە گەڕانەوەی عەرەبی هاوردە بووە بەشێك لە هەنگاوەکانی ئاساییکردنەوە. عەرەب لە ئاستی عێراق، لەئاستی دونیای عەرەب و هەندێك لە رێکخراو و کۆمەڵەکانی مافی مرۆڤیش لە دونیا کەوتنە هاوار، ئێستاش ئەو هاوارەیان بەردەوامە، کە گوایە گەڕانەوەی عەرەب (دەرکردنە) لە جۆرێکی ترو هەڵەی (تەرحیل)ی کورد بە هەڵەی (تەرحیلی) عەرەب چارەسەرناکرێت.

لەراستیدا هۆی ئەم گرفتە سەرکردە عەرەبەکانی عێراق (سەرکردەکانی ئەنجومەنی حوکم) بوون، چونکە:

ا. ئەوان ئازایەتی ئەوەیان نەبوو لەو برگە چارەنووسسازەی عێراق بریار لەسەر ئەوە بدەن بێ راپرسی و ئاساییکردنەوەو (کیتابونا کیتابوکم) کەرکوك بدەنەوە کوردستان.

ئەگەر ئەوەیان بکردایە کورد پێی لەسەر گەڕانەوەی تەعریب دانەدەگرت، چونکە کەرکوکی کوردستانی لەو حاڵەتەدا پێویستی بەراپرسی نەدەبووو ئەو پرسیارەش نەدەهاتە کۆڕێ ئایا عەرەبی تەعریب دەبێ بڕۆنەوە یان مافی ئەوەیان هەیە دەنگ لە چارەنووسی کەرکوك بدەن؟

ب. ئەوان خۆیان هاووڵاتیانی عەرەبیان لە کەرکوك خستە بەردەم ئەو رەوشەوە کە ببنە دەسکەلا بۆ (ئارەزوویەکی نوێی تەعریبکردن و درێژکردنەوەی نفوزیان لە کوردستان و بۆ بەکارهێنانیان لە هەڵمەتەکانی هەڵبژاردنی عێراقی دیموکراسیدا وەکو بنکەیەکی دەنگدەر لە کەرکوك).

ج. ئەوان خۆیان ئازایەتی حکومەتی ئیسرائیلیان تێدا نییە کە بۆ بەرژەوەندی نیشتمانیی و بۆ ئایندەی ئاشتی (عەرەب – ئیسرائیل) مستەوتنینەکانی کرد.

ئەوانەی بۆ عەرەبی هاوردە دەگرین مەبەستیان مافی مرۆڤو سەربەستی شوێنی نیشتەجێبوون نییە، بەڵکو مەبەستیان بەکارهێنانی نا ئینسانیانەی هاوردەکانە بۆ مەبەستی سیاسی درێژەپێدانی تەعریب و پەیداکردنی نفوزی سیاسیی بۆ حوکمرانانی ئەمڕۆ کە قوربانی دەستی سیاسەتی شۆڤێنی و تایفەگەری بەعس بوون. لە جێی ئەوە دەیانتوانی کار لەسەر گێرانەوی سەربەرزانەی هاوردەکان بکەن و ژیان و گوزەرانێکی نوێیان بۆ دابینبکەن.

**شەشەم: رەوتی ماددەی ٥٨و ماددەی ١٤٠:**

بەمجۆرە تێدەگەین ماددەی ٥٨ کەبووە ماددەی ١٤٠ لە دەستووری هەمیشەییدا هەم نەخشەی رێگایە بۆ چارەسەرو هەمیش گیروگرفتی هەیەو هەمیش گوزارشتە لەبەرییەککەوتنی ئیرادەی دوولایەنی ململانێ بەسەر ناوچەکانی جێی ململانێیەوە، کورد نەیدەتوانی کەرکوك وەربگرێ وعەرەبیش نەیدەتوانی لە کوردی وەربگرێت. ئەمەش جەوهەری ململانێی کەرکوکە لەم قۆناغەدا. هەموو ئەو کێشە وگرفتانەی لەسەر کەرکوك روویانداوە لە:

١. لە هەڵوەشانەوەی بریاری (٤٢)ی حیزبی بەعس و بریاری گەڕانەوەی تۆماری نفوس و شۆرنەکردنەوەی ئەو بریارانە بۆ خوارەوە.

٢. لە دروستکردنەوەی ناحییەکانی شوان و قەرەحەسن و قەرەهەنجیر.

٣. ساردی حکومەتەکەی عەلاوی.

٤. لە هەرەشەی کورد بەوەی بەشداری هەڵبژاردن ناکات چونکە حکومەتی کاتی (٥٨)ی جێبەجێنەکردووە.

٥. لە بەڵێننامەی نووسراوەکانی غازی یاوەری سەرکۆمارو عەلاوی سەرۆك وەزیران و سەفارەتەکانی بەریتانیا و ئەمریکا لە بەغدا بۆ سەرکردایەتی کوردستان (ئەم بەڵێنانە بۆ ئەوە بوون کورد لە هەرەشەی بەشدارینەکردن لە هەڵبژاردنی عێراق و هەڵبژاردنی پارێزگاکان کە لە کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥)دا سازکرا پاشگەزببێتەوە).

٦. لەخۆدزینەوە وفرتوفێڵەکانی جەعفەری.

٧. لە هەرەشەی هەڵوەشانەوەی رێککەوتنی کوردو شیعە، کە لەسەر بنچینەی ئەو رێککەوتنە حکومەتی ئینتقالی دامەزراوەو نامەکانی مام جەلال وکاك مەسعودو نامەکەی د. بەرهەم ساڵح بۆ جەعفەری.

٨. لەخاوخلیچکردنی جەعفەری بە دروستکردنی لیژنەکانی حەمید مەجید موسا (لەسەردەمی عەلاویدا موسا وەك سەرۆکی لیژنەی ئاساییکردنەوە دانرا).

٩. لە پەککخستنی ئەو دوا پارەی (١٠٠) ملیۆن دۆلارەکەی

ناوەدانی کەرکوك.

١٠. لە ئەستۆ لابردنی تاوانی جێبەجێنەکردنی ماددەی ٥٨و تۆمەتبارکردنی ئیدارەی کەرکوك بەکەمتەرخەمی (بوختانی جەعفەری لەسەروبەندی سەردانی بۆ کوردستان دوای پەسەندکردنی دەستوورو هەڵبژاردنی دووەمی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥ کە بۆ دابینکردنی پشتیوانی کورد هاتبوو).

١١. لە خاوەخاوی مالکی بۆ جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ وئینجا پاشگەزبوونەوەی و بەپەلە دەرکردنی بریاری پێکهاتنی لیژنەکە وتا دوا سێ بریاریان بەدەستپێکردنی گەرانەوەی راگوێزراوان بۆ سەر ماڵ وکاری خۆیان.

١٢. بۆ دەستی دەستی پێکردنی هەیئەی مونازەعاتی موڵکدارێتی کە تەنها لە کەرکوکدا پتر لە (٣٦) هەزار داوای موڵکدارێتی تۆمارکراوەو بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی تری عێراقدا (٢٪) کێشەکان چارەسەر کراون.

١٣. کۆرو کۆنفرانسی ناوەوەی کەرکوك و هەرێم و دەرەوەی وڵات وکۆبوونەوەی جەماوەری ولێدوانی جیاجیا وهەرەشەی هەمەلایەن وکۆر وکۆنفرانسی نەیارانی کورد لە حەویجەوە بۆ کەرکوك و بۆ ئەنقەرە.

١٤. تا تەشقەڵەی ئیرهابییەکان و نا لەباری باری ئەمنی و خۆگیفکردنەوەکانی میلیشیاکانی سەدر، هەر هەموو ئەمانە گوزارشتی جیاجیان لە شەری ئیرادەی کوردو نەیارەکانی بۆ ساغکردنەوەی چارەنووسی کەرکوك لە ماددەی (١٤٠)یان بەشێوازی جیاجیا. هەتا ئەم شەرەش یەکلایی دەبێتەوە ئەم رەوتە دەمێنێ وهەدەردانی بۆ نییە(*).

*** بەشی دووەم: تەگەرەکانی بەردەم (١٤٠)و هەڵوێستی لایەنەکان:**

ئەم ماددەیە مشتومری زۆری لەسەرکرا، چەندین لیژنەی بۆ دانرا، وتارو بابەت و مێزگردو بەرنامەی تەلەفزیۆنی لەسەر جێبەجێکردن و جێبەجێبەنەکردنی کراوە، بەڵام لەرووی عەمەلییەوە تا ئێستا کاری جدی و واقیعی بۆ نەکراوە. ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەو کۆسپ و تەگەرانەی لەبەردەم جێبەجێکردنیدا دروستکراوەو دروست دەکرێت.

**یەکەم: هەڵوێستی لایەنەکان:**

دەکرێ لێرەدا ریزبەندییەك دروستبکەین چونکە پۆلینەکردنی ئەو کەس و گرووپانەی دژی جێبەجێکردنی مادەکەن و دیاری نەکردنی هۆکارو ئامانجەکانیان لەو دژایەتیدا یەکێکە لە هۆکارەکانی نەبوونی بەرچاوروونی لە سیاسەتی کورددیدا:

**١. تورکیا:**

تورکەکان زەمەنێکی زیاتریان دەوێت تا بتوانن ئەزموونی هەرێمی کوردستان قبوڵبکەن. پێیان وایە ئەگەر کورد کەرکوکیش کۆنترۆڵ بکات ئەمە یان دەبێتە بنکەی ماددی و ئابووری بۆ نەتەوەی کوردو هەوێنی دەوڵەتی کوردی یان رۆڵی کورد لە عێراقی تازەدا بە هێزتر دەکات لە کاتێکدا هێشتا تورکیا ئەم رۆڵە سنووردارەی کوردی پێ قووتنەدراوە. هەموو ئەم پێشکەوتنەی هەرێمی کوردستان بە خۆوەی دەبینێ کاریگەری لەسەر رەوشی ناوخۆی تورکیا دەبێت. رەنگە هەندێ لەهەڵوێستەکانیشی پەیوەندی بەمەسەلەی پەکەکەوە هەبێت.

تورکیا چ بەهەرەشەی پەنابردن بۆ کاری سەربازیی، چ بە گوشار خستنە سەر حکومەتی عێراق و ئەمریکاو چ بە هاندانی توندرەوەکانی بەرەی تورکمانی و رێگرتن لە بچوکترین ئەگەری گرتنەبەری سیاسەتی دانوستاندن لەگەڵ سەرکردایەتی سیاسی کوردستان بۆ گەیشتن بەسیغەیەکی پێکەوەژیان، نەیاری خۆی لەگەڵ هەرێم پیادەدەکات. ئەو هەرێمەی کۆمپانیا تورکییەکان پشکی شێری پرۆژەکانی ئاوەدانکردنەوەیان تێدا زامنکردووە. رەنگە ئاسەواری مامەڵەی بازرگانی و ئابووری درەنگتر، دوای نیشتنەوەی کەفوکوڵی سیاسیی، دەربکەوێت و کاری ئیجابی لەکەمکردنەوەی هەرەشەی پەلاماردانی ئەو هەرێمە بکات کە کۆمپانیاکانی تورکیا سەرمایەگوزاری تێدا دەکەن. هەر بۆیە تورکیا بە بەردەوامی دنەی ئەو لایەنانە دەدات کە دژایەتی ماددەی (١٤٠) دەکەن و بانگێشتیان دەکات بۆ بەستنی کۆنگرەی جۆراو جۆر:

أ. لەگەڵ رووخانی رژێمی بەعسدا داوەتی عەرەبەکانی تەعریب و عەرەبی حەویجەو بنەماڵەی عاسی کرد بۆ ئەوەی بچنە ئەنقەرەو کەناڵی پەیوەندی و پشتگیری بۆ دروستکردن و تا ئێستاش ئەو سیاسەتە درێژەی هەیە.

ب. لەگەڵ پەسەندکردنی قانونی ئیدارەی دەوڵەت لە ئەنقەرە ئینجا لە ئەستەنبول کۆنگرەیەك لە دژی رێکخرا کە زۆربەی ووتەو تێروانینەکانی دژی مافەکانی کوردو دژی ئاساییکردنەوەی کەرکوك بوو.

ج. لەگەڵ نزیکبوونەوەی ئیستحقاقاتی ماددەی (١٤٠) چەند کۆرو کۆنگرەیەکی کرد لەدژی کەرکوك و کورد کەدواینیان کۆنگرەی کەرکوك (٢٠٠٧) بوو.

تورکیا ئەگەرچی راستەوخۆ وەکو دەوڵەتەکانی تر بەکردەوە تیرۆریستییەکانەوە تێوەنەگلاوە بەڵام هەموو لەبیرمانە ماوەیەکی کەم دوای دەستبەکاربوونی پارێزگاری کەرکوك، عەبدولرەحمان مستەفا، تورکەکان تیمێکی تیرۆرکردنیان بۆ کوشتنی پارێزگاری کەرکوك. دەستەیەکی هەڵکوتانە سەری ئەمەریکایی تیرۆیستەکانیان دەستگیرکردو کیسەیان خستە سەریان. ئەم رووداوە بووە هەوێنی فیلمی (دۆڵی گورگەکان).

ئەم هەڵوێستە خراپانە ئەگەرچی رەهەندێکی مێژوویان هەیە، بەڵام هەندێ جار سیاسەتی رۆژو موزایەدەی سیاسی لایەنەکانی ناوخۆی تورکیاشی تێدەکەوێت. وەکو ئێستا کە سەرۆك وەزیران رەجەب تەیب ئۆردوگان دەیەوێت بچێتە کۆشکی کۆماری تورکیاوە. بەداخەوە ئەو نەرمی و پشوو درێژییەی لەماوەی چەند ساڵی رابردوودا ئەنقەرە گرتییە بەرو حورمەت و رێزێکی لەناو عێراقییەکان بۆ حکومەتەکەی ئۆردوگان دروستکردبوو، لە دەست دران، هەڵوێست و سیاسەتەکانی ماوەی رابردووی ئۆردوگان – گۆڵ گر لە پووشی کەرکوك بەردەدا تا ئەوەی یارمەتیدەری

هێورکردنەوە بێت. هەموو هیوایەك ئەوەیە ئەمە تەنها پێشبرکێیەکی هەڵبژاردن بێت نەك پێشبرکێی توندڕەوی. رەنگە بەشێکیشی پەیوەندی بەمزایداتی خیتابی سیاسیی کوردییەوە هەبێت.

**٢. ئێران:**

ئێرانیش هاوشێوەی تورکیا ئارەزووی لێ نییە کەرکوك بۆ کوردبێت، بەڵام تاران وەکو ئەنقەرە گرێی مێژوویی لەگەڵ کەرکوکدا نییە. گرێی گەشەکردنی مەسەلەی کوردە لە عێراق کە هانی کوردەکانی ڕۆژهەڵات دەدات بۆ تێهەڵچوونەوە. بۆیە پێی خۆشە مەسەلەی کورد وەکو گیسەکەی هەیاس بێت، نەقەڵەو نە لاواز، لەژێر چاودێری خۆیدا بێت. ئێران دەزانێ کەرکوکی کوردستانیی بزوتنەوەی کورد دەسەڵاتدار دەکات. لەبەرامبەردا دەشزانێ پایەداربوونی شیعە، بەتایبەتی تەیاری سەدری و دەعوە، بە زەوتکردنی کەرکوك مسۆگەرتر دەبێت. لەم پێناوەدا شیعەی تەعریب و شیعەی تورکمانی هاوپەیمانیان دەتوانن دەسکەلابن.

**٣. سوریا:**

سوریا و دنیای عەرەب: گرفتێکی تایبەتیان لەگەڵ کەرکوکدا نییە وەك کەرکوك. ئەوان تەواوی خاکی عێراق بە کوردستان و کەرکوکەوە بەشێك لە نیشتمانی عەرەب دەزانن.

ئەجیندای سوریا گێرانەوەی عروبەی عێراق و شکستپێهێنانی پرۆژەی ئەمەریکایە لە عێراق. بۆ ئەمە پشتیوانی لەو هێزە توندڕەوانەی عەرەبی سوننە دەکات کە ئەجیندایان لە کەرکوك هەیە.

لەم بوارەدا دەکرێ بیڵێین دەشێ کەرکوك گۆرەپانێکی کارکردن بێت بۆ سوریا و هەندێك لە وڵاتە عەرەبییەکانی تر، بەڵام بێ ئەوەی ئەمە مانای بوونی سیاسەتێکی تایبەتی (کەرکوکیانە) بگەیەنێت. لەبەر ئەم هۆکارانە دژی پرۆسەی سیاسی و پرۆسەی دەستووریین بەماددەکانیشیەوەو دەیانەوێ ئەوەی لە عێراق و کەرکوك و کوردستان هەیە بنکۆڵ بکرێن.

**٤. عەرەبی سوننە:**

عەرەبی سوننە ئاغای عێراق و کەرکوك بوون. جێبەجێکاری سیاسەتی تەعریب و دارێژەری بوون. قوڵاییەکی مرۆییان لەناو پارێزگای کەرکوك و پارێزگا سوننییەکاندا هەیە و بەمەش هەولدەدەن لە حەویجە و ریازەوە، لە دیالەو تکریت و روومادی و بەغداوە، درێژە بە سیاسەتی دژایەتیکردنی کوردستانێتی کەرکوك بدەن. بەشێکی بەرچاوی ناسراوەکانی عەرەبی سوننە لەو عەرەبانەن کە بەعسی بوون و کوردیان کوشتوەو ئەنفالکردووە، هەیانە لە مێژە، پێش سیاسەتی تەعریب، هاتونەتە کەرکوك و هەشیانە بەشێکن لەو سیاسەتە.

ئەمانە لەبەر ئەنگێزەی سێ کوچکەی عروبە و ئیسلامی سیاسی و توندرەوەی تیرۆیستان، حەزیان بە کەرکوك و کورد نییە. ئەجیندای تایبەت بە کەرکوکیان هەیە و ئەجیندای تایبەت بە تێکرای عێراقیشیان هەیە، چونکە هێزە سوننە قەومییەکانی عێراق و دونیای عەرەب دنەی ئەمانە دەدەن. ئەگەر سیاسەتی تیرۆرو دیکتاتۆری لەسەرانسەری عێراقدا شکست بخوات سوننەی عەرەب دەرفەتی پێداچوونەوەیان بۆ دەرەخسێ و لەوانەیە بگەنە فۆرمەلەیەکی هاوبەشدا لەگەڵ کورددا بۆ دروستکردنی پەیوەندی دراوسێتی باش یان بۆ گەیشتن بە جۆرێك لە بەشداریکردن. رەنگە ووتارەکە گونجاوتر بێت ئەگەر ئەوان لاوازو پەراوێزکەوتنەوە. دەکرێت سیاسەتێکی ئەوتی دروست و ژیر لە عێراق بەشی هەرێمی بێ سامانی سوننە زامن بکات چونکە ئەوان ترسی ئەوەشیان هەیە ئایندی عێراق بە یەکگرتوویی نەمێنێتەوە لەو دابەشبوونەدا وەك سوننە بێ پایەیەکی ئابووری بەهێز لەنێوان کوردو شیعەدا بمێننەوە.

**٥. شیعە:**

عەرەبی شیعە: ئەمانە دەسکەلای بەعسی سوننە لە جێبەجێکردنی سیاسەتی تەعریبدا. دەکرێ بکرێن لەسێ بەشەوە:

– بەشێکیان بەعسی بوون بۆ پارەو دەسەڵات هاتوونەتە کەرکوك، بەتایبەتی کە شیعە بۆی نەبووە لە خواروو دەسەڵاتداری ناوچەی خۆی بێت با تەنانەت بەعسیش بوایە.

– بەشێکیان بەعسی وەك سزاو تۆڵەسەندنەوە دووری خستبوونەوە تاوەکو لەگەڵ کورددا تووشی بەرییەك کەوتن بێن لە جێی ئەوەی گرفت بۆ بەعس دروستبکەن لە خواروو.

– بەشێکیان دوای پارەو تەماعی دونیا کەوتبوون و لە شوێنی خۆیان بێ نەواو بێ توانا و بێ رەسیدی کۆمەڵایەتی بوون.

شیعەکانی تەعریب بەگشتی ئامادەی رۆشتنەوەن، زۆربەیان بە قسەی سیستانی دەکەن کە ئەوانی بە میوانی کەرکوك داناوە. چاوەرێی قەرەبووکردنەوەو گەرانەوەن و تەماعیان لەپارەی قەرەبووکردنەوەیە. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك جار سوپای مەهدی (تەیاری سەدری) دەرمانی ووزە بەخشی مانەوەیان پێ دەدەن و تەشویقیان دەکەن شارەکە جێ نەهێڵن.

تەیاری سەدری لێرەش هەژاری زۆرینەی شیعە بۆ ئەجیندای سیاسیی خۆی دەقۆزێتەوە. بەگوێرەی فایلی زانیارییەکانی لیژنەی حیوارو لێکگەیشتنی نیشتمانیی (٧٠) هەزار عەرەب بە فۆرمی خۆراك و داخوازی گەرانەوەو ناوو پەنجە مۆرەوە ئامادەی گەرانەوەن. لێ چاوەرێی ئەوەن یەکێك قەرەبویان بکاتەوە تاوەکو برۆن. تا ئێستا نەحکومەتی عێراق و نە سەرکردایەتی سیاسیی کوردستان ئەو قەرەبوکردنەوەیان بۆ دابین نەکردوون.

**٦. تورکمانی جەبهە:**

تورکمانی جەبهە: جەبهەی تورکمانی نوێنەرایەتی ناسیونالیستی توندرەوی تورکمانی دەکات. ئەدەبیاتی ناسیونالیستی تورکمانی لە بنچینەدا لە ئەدەبیاتی دایك، ئەدەبیاتی ناسیونالیستی تورکیەوە، وەرگیراوە کە ئەو لەوێ

خۆی ئینکاری بوونی نەتەوەی کورد دەکات لە تورکیا چ جای ئەوەی پێی قبوڵ بێت کوردستان خاوەنی کەرکوک بێت. تورکمانەکانی جەبهە خراپ و درن لە مامەڵەکردن، بەڵام بمانەوێ بەشێکی بەرچاوی تورکمانەکانی کەرکوک دەنگیان بەوان داوە و ئەوان لەم قۆناغە هەستیارەی کەرکوکدا نوێنەرایەتی ویستە ناسیونالیستەکانی تورکمان دەکەن. مامەڵەی بەرتەسکی هەندێک کورد لەگەڵ تورکمان رەسیدی ئەوانی پەرەپێدا. بەڵام هەر لەبەرئەوەی لەگەڵ جەبهە جیاوازین دەبێ هەوڵی چارەسەر بدەین لەگەڵیان، چونکە ئەوان نە ئێمەن وەکو ئێمە بیربکەنەوە و نەهێزە تورکمانیە هاوپەیمانەکانی کوردن لە سیاسەت و خیتابی رۆژانەیاندا وەکو کورد بیر دەکەنەوە. بێگومان جەبهە شکست بێنێ تورکمان و جەبهەش زەرەر دەکەن، بەڵام کوردیش لەگەڵیان زەرەر دەکات.

تورکمانی جەبهە بە چەند شێوە چارسەر دەکرێن:

١. یان ئەوەتا زەمەن پەراوێزیان بخات و هیچ بەهیچ نەکەن ئەوەش کەس نازانێ دەکەوێتە دوای دیاریکردنی چارەنووسی کەرکوک کە هیچ کەڵکی بۆ کورد نابێت یان دەکەوێتە پێش ئەوەوە!؟

٢. پرۆسەی سیاسیی عێراق و کەرکوک ئەزموونی فێربکات و لە کەلی شەیتانی داوا ناقۆڵاکانی بێتە خوارەوە.

٣. یان کورد بتوانێ لەرێی دابینکردنی راستگۆیانەی داخوازی تورکمانەکانەوە ئەوان گۆشەگیر بکات.

٤. یان کورد بگاتە لێکگەیشتنێکی هاوبەش لەگەڵیان بە ئامادەبوونی تورکیا یان بەهاندانی ئەوان.

٥. یان بەتێگەیشتنێکی واقیبینانەوە ئەو هەقەی لای ئێمەیە بیاندەێنی و ئەوەشی لای ئێمە نییە لەگەڵیاندا داوا بکەین و حکومەتی عێراق هانبدەین داخوازی زیاتریان بۆ جێبەجێبکات.

**دووەم: تەگەرەکانی زادەی کەموکورتین:**

١. لاوازی و سستی و خۆ دزینەوەی حکومەتی عێراق لە جێبەجێکردنی ئەم ماددەیە، هەر لە تەرخاننەکردنی بودجەی پێویست و دواخستنی ئیش و کارەکانی لیژنەی جێبەجێکردنی ماددەکەوە تا دەگاتە دروستکردنی کۆسپ و تەگەرەی جۆراوجۆر بە بیانووی ناجێگیری و نا ئارامی و گوشاری دەوڵەتەکانی ئیقلیم و پەیوەندی ماددەی (١٤٠) بە ناوچەکانی دیکەی عێراقەوە. وەزارەتەکانی حکومەتی عێراق بە بیانووی نوێ و شێوازی جیاجیاوە هەوڵی بەعەرەبکردنیان داوە. لە وەزارەتەکەی عەلاوی وەزیری بەرەڤانی چەند بریارێکی بۆ دابینکردنی زەوی بۆ ئەفسەرانی سوپای پێشوو دەرکرد، وەزیری نەوت و زۆربەی وەزارەتەکانی تر بە بیانووی دامەزراندنەوە عەرەب دەنێرنە کەرکوک.

٢. ئاڵۆزی بارودۆخی عێراق و بێ سەرو بەری و رۆتین و گەندەڵی. ئەمانەش هۆکارن بۆ گۆرینی ئەولەویاتەکانی حکومەتی عێراق.

٣. تەگەری گۆران لە کابینەکەی مالکی و تەنانەت تەگەری هەڵوەشاندنەوەی حکومەتەکەی و ململانێی نێوان سونە و شیعە و قوڵبوونەوەی بۆ شەری تایفەگەری کاریگەری لەسەر جێبەجێکردنی ماددەکە دەبێت.

٤. نەبوونی هەماهەنگی لەنێوان لیژنەکانی چاودێری جێبەجێکردنی گرووپی کوردی لە لیژنەی باڵای جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) و خوێنەدنی هەر لیژنەیەک لە ئاوازێک، فرەیی ئەو لیژنانە و ناروونی کارەکانیان، هەندێک لەم لیژنانە هەر دیکۆری پیرۆکراسین و زیاتر بۆ کاری لێدوان و پرپاگەندەی میدیایی و شەری مایکرۆفۆنن. لیژنەکانیش ئەمانەن: لیژنەی پەرلەمانی عێراق، لیژنەی پەرلەمانی کوردستان، لیژنەی حکومەتی کوردستان، لیژنەی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک، نووسینگەی نوێنەرایەتی سەرۆکی هەرێم، لیژنەکانی لق و مەڵبەندی پارتی و یەکێتی و لیژنەی راگەیاندنی ماددەی (١٤٠).

٥. لاوازی ئەدائی گرووپی کوردی لە بەغدا، دەوام نەکردن، نەبوونی هەماهەنگی و پشت گوێ خستنی ماددەی (١٤٠) و نەبوونی چاودێرییەکی ئەکتیف لەسەر گرووپی کوردی لە بەغدا.

٦. کورتی ئەو ماوەیەی بۆ جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) ماوەتەوە کە لە ساڵێک کەمتر ماوە و تا ئێستا قۆناغی ئاسایی کردنەوە و کارەکانی ئەنجام نەداوە. بە بێ ئەوەی کورد لە دانانی میکانیزمدا رەچاوی ئەو لەمپەرە دژانەی کردبێت کە چاوەروانکراو بوو بێتە رێی قۆناغەکانی ئاساییکردنەوە. واتا لەمپەری دژەکانی کورد ئەگەر سەریشنەکەوتبێت توانیویەتی لەکات و زەمەنی خشتە زەمەنییەکە بخوات و بەفیرۆی بدات بێ ئەوەی کورد. لەسەرەتای نەخشەکەوە، حیسابی پەراوێزی زیاتری کاتی کردبێت بۆ بردنەوەی زەمەن.

٧. لاوازی و سستی و کەمتەرخەمی سەرکردایەتی سیاسی کوردستان بە حکومەت و پەرلەمانی کوردستانیشەوە چ لە کارکردن بۆ ئاوەدانی و پێشکەوتنی کەرکوک و چ لە هەنگاونان بۆ جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠).

٨. لاوازی و کەمتەرخەمی لە نیشتەجێکردنی ئەو ئاوارانەی تا ئێستا گەراونەتەوە، کە بەداخەوە بە جۆرێک ژیان بەسەر دەبەن گەرانەوەیان نەبووە نموونە و هاندەرێکی ئیجابی بۆ ئەو ئاوارانەی تا ئێستا نەگەراونەتەوە. دەکرا دەسەڵات و ئیدارەی کوردی خۆی رۆڵی گەورەی لە نیشتەجێکردنیاندا بگێرابایەوە بە مەسەلەکەی حکومەتی عێراق نەسپاردایە کە ئەولەویاتی تری هەیە و پێی خۆشە مەسەلەی کەرکوک دوابخرێت.

٩. نەگەیشتنی سەرکردایەتی سیاسی کوردستان لە کەرکوک لەگەڵ نەتەوە رەسەنەکانی کەرکوک بەگشتی و تورکمان بەتایبەتی بە سیغەیەکی تەوافوقی بۆ یەک هەڵوێستی بەرامبەر ماددەی (١٤٠)، لەمەدا کورد نەیتوانی ببێتە خاڵی کەمەندکێش (جەزب) بۆ نەتەوەکانی دیکە.

لاوازی بوارەکانی خزمەت گوزاری و ئاوەدانکردنەوەی کەرکوک و بێ سەرو بەری ئیدارەی کەرکوک لە بەرێوەبردنی شارەکە. هەروەها نەبوونی یەکسانی و عەدالەت لە دابەشکردنی پۆستە ئیدارییەکان و رەچاونەکردنی ویستی

نەتەوەکانی دیکەی کەرکوك و تەجاوزکردنە سەر موڵك و ماڵی تورکمان لە گەرەکی تسعین و شوێنی تر لەلایەن هەندێك کەسی نامەسئوڵەوە بێ ڕەچاوکردنی کاریگەری ئەو مەسەلەیە لەسەر ڕووی شارستانی و ناوبانگی گەلی کورد.

١٠. گرێنەدانی بەرژەوەندییەکانی سەرمایەدارانی نەتەوەکانی دیکەی کەرکوك بە کوردستانەوە. لەواقیعدا هیچ هاندانێك نییە بۆ ئەو نەتەوانە کە هەست بکەن بەشێکن لە ئابووری و بەرژەوەندییەکانی کوردستان. تاوەکو بازاڕو کەسابەتیان گرێبدرێت بە بازاڕو ژیانی ئابووری کوردستانەوە.

١١. بەهەر هۆیەکەوەبێت گۆڕان لەسیاسەت یان کشانەوەی ئەمریکا، بێکاریگەرنابێ لەسەر دۆخی عێراق بەو شێوەیەی بپەرژێتە سەر جێبەجێکردنی بەندو بڕگەکانی دەستوور.

**سێیەم: ململانێی سیاسی و نەبوونی مەرجەعێك**

١. ململانێی هێزە سیاسییە کوردییەکان بە تایبەتی ململانێی نێوان یەکێتی و پارتی. ئەم ململانێیە کاریگەری سەلبی لەسەر هاووڵاتیانی کورد لە کەرکوك داناوە بە جۆرێك کە ڕاکێش ڕاکێشی خەڵك بۆتە مایەی پەرەسەندنی سیاسەتی موزایەدەکردن لە کوردایەتی و سەرەنجام:

- ڕێکنەکەوتنێکی کۆنکرێتی لەسەر ڕێوشوێنی بەڕێوەبردنی بەشی کورد لە شارەکە.
- کۆکردنەوەی خەڵکی خراپ کە دەبنە مایەی شێواندنی ناوبانگی کورد لە شارێکی هەستیاری وەکو کەرکوکدا.
- نەبوونی مەرجەعیەتێك بۆ بڕیاری سیاسی لەمەسەلە نەتەوەیی و هەستیارەکانی کورد لە ئیدارەی ناوخۆیی شار. لەبواری خزمەتگوزاری و ئەمنی و... هتد دا. ئەمەش لەبەر نەبوونی ژوورێکی عەمەلیاتی باڵاوە کە مەسەلەی سیاسیی کەرکوك بۆ سەرکردە لۆکاڵییەکانی شارەکەو بۆ سیاسەتی ڕۆژو ڕێکەوەت و چانس بە جێنەهێڵێت. بەداخەوە بە گوێرەی سەرنجی هەڵسوراوێکی سیاسی لە کەرکوك تا ئێستا لیژنە باڵاکەی یەکێتی و پارتی هیچ ژوورێکی عەمەلیاتی پێکنەهێناوە کە گرێدراوی مەرجەعی سیاسی کوردستان بێت. هیچ کۆنفرانسێکی جامع و مانع نەکراوە کە نەخشەی ڕێگا دیاری بکات و کێشەکانی کەرکوك لە دەست ئیجتیهادی شەخسی و سیاسەتی تاقیکردنەوەی هەڵەو ڕاست دەرباز بکات.
- سیاسەتی موزایەدە وای کردووە کە مەیلی ناسیونالیستی پێش مەیلی پێکەوە ژیان و دەستپێشخەری سیاسیی بکەوێت. هێزە کوردییە سەرەکییەکان ناوێرن دەستپێشخەری لە نزیکبوونەوە لە تورکمان و کلدو ئاشووری و عەرەبە دیموکراتخوازەکان بکەن نەوەکو بە (فرۆشتنی کێشەی کەرکوك) و دەست شلکردن تۆمەتبار بکرێن. ئەمەش گرێدراوی هۆکاری پێشووترە (نەبوونی مەرجەعیەت و نەخشەی ڕێگا).

٢. نەبوونی گرووپێکی لێکۆڵینەوە لەسەر ماددەی (١٤٠)، بەمەبەستی لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر لە بواری سیاسیی و ڕاگەیاندن و دارایی و یاسایی و دابەشنەکردنی کارەکان بەسەر گرووپی جۆراوجۆردا.

٣. نەبوونی تۆڕێکی فراوانی پەیوەندی بۆ کارکردن لەسەر چاککردنەوەی وێنەی کوردو کەمکردنەوەی نیگەرانی و مەترسییەکانی بەرامبەرەکان. بەتایبەتی تورکمان کە ڕووداوەکانی ساڵی (١٩٥٩) لە یادەوەرییاندا ماوەو هێزە توندڕەوەکان ئەو یادەوەرییە بۆ دژایەتیکردنی کوردو تیژکردنی ناکۆکییەکان بەکاردەهێنن لەوەختێکدا هێشتا هەڵوێستی کورد لەم ڕووداوە ڕوون نەکراوەتەوە کورد قسەیەکی ڕاشکاوی لەسەر نەکردووە.

٤. نەبوونی نەخشەیەکی هاوسەنگ و هەمەلایەنە بۆ جوڵانی شەقامی کەرکوك و دروستکردنی ڕای گشتی لەسەر جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠). ئەمانەو چەندین تەگەرەو کۆسپی تر وایکردووە ماددەی (١٤٠) لەکاتی خۆیدا جێبەجێ نەکرێت.

*** بەشی سێیەم: ئەڵتەرناتیڤی تر بۆ ماددەی ١٤٠:**

ئەم بەشە لە لێکۆڵینەوەکەمان دەیەوێ بەو ئەگەرە مامەڵەبکات کە (ئەگەر) ماددەی (١٤٠) لەکاتی خۆیدا تەواو نەکرا، یان هەمووی جێبەجێنەکرا، کورد چی بکات؟ لێرە دەخوازین قسە لەسەر سیناریۆی ترو لەسەر گۆڕینی ماددەی (١٤٠) لە حاڵی جێبەجێنەکردنی بۆ دەسکەلایەکی دانوستاندن بکەین.

**یەکەم:** لەبەر ئەوەی حکومەتەکانی عەلاوی و جەعفەری وادەیەکی زۆریان تێپەڕاندو لیژنەی جێبەجێکردن و میزانییەی پێویستیان نەخستە بەردەست، دەکرێ کورد گوشاربکات تاوەکو حکومەتی مالکی قەرەبووی کات و میزانییەو ئالییەتی خێراکردنی جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠) بکاتەوە. بۆ نموونە ئەو وادانەی لە بەرنامەی کابینەکەی مالکی دانراون بۆ ئاساییکردنەوە، کە پشتیان بە دەستووری هەمیشەیی بەستووە. درێژبکرێتەوە یان بە کراوەیی بهێڵرێتەوە تا کۆتایی ساڵ.

**دووەم:** لەبەغدا سەرکردایەتی کورد مفاوەزاتێك یا خود حیوارێك دەست پێبکات، بەپاساوی خاڵی یەکەمەوە، بۆ ئەوەی بەشێك لەقۆناغەکانی جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠) بەبڕیاری سیاسیی جێبەجێبکرێن، بۆ نمونە وەك بڕیاری گەڕانەوەی یەکە کارگێڕییەکانی کە بەپێی بەرنامەکەی مالکی وادەی ئەوە نەماوە ئەو مەسەلەیە بخرێتە موناقەشەی پەرلەمانەوە. بەڵکو بە بڕیار بکرێن.

**سێیەم:** لەبەرئەوەی بەدەر لە کەرکوك ژمارەیەکی زۆری شارو شارۆچکەی تری کوردستان، کە (١٣) قەزاو دەیان ناحییە دەگرێتەوە، وەکو پێویست کار بۆ ئاساییکردنەوەیان نەکراوە، دەکرێ سەرکردایەتی سیاسیی کوردستان هەوڵ بۆ دروستکردنی چەند یەکەیەکی ئیداری تازە بدات، یاخود بیر لەوە بکرێتەوە دەستکاری یەکە کارگێڕییەکانی کوردستان بکرێت بە هەماهەنگی بەغدا بۆ چارەسەرکردنی گرفتی ئەو قەزاو ناحییەیانەی دەکەونە ناو ناوچەی ململانێوە.. بۆ نموونە بەپارێزگاکردنی خانەقین کە هەر یەك لە قەزاکانی

خانەقین‌و کفری‌و مەندەلی (کە سەر بە پارێزگای دیالەیە) و قەزای بەدرە (کەسەر بە پارێزگای کووتە) بگرێتە خۆی. ئەم چوار قەزایە کە بەناوچەی ململانێی دائەنرێن بکرێنە یەك پارێزگا، ئەوکاتە گرفتی لەگەڵ دیالە نامێنێ، دەکرێت سەرکردایەتی کورد بە مفاوەزات لەگەڵ لایەنەکانی تر کار لەسەر ئەمە بکات.

**چوارەم:** دەکرێ هەریەك لە قەزاکانی شێخان‌و شەنگارو بەعشیقەو تەلعەفەرو تەلکێف، بەسەرجەم ناحییەکانیانەوە، یان بکرێنە وەحدەیەکی ئیداری سەربەخۆ وەك پارێزگایەکی تازە، یاخود بخرێنە سەر پارێزگای دهۆك، چونکە هەموویان لەناو سنووری جوگرافی کوردستاندان‌و بە پێچەوانەی کەرکوك ئەو گرفتەیان نییە لەسەردەمی بەعسدا لە پارێزگایەکی کوردستانەوە خرابنە سەر پارێزگایەکی تر، بەڵکوو چەند قەزایەکی کوردستانن‌و بەر پاکتاوی نەژادی کەوتوون‌و کێشەی ئیداریان دەبێ لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا‌و دەکەونە سەر پارێزگای موسڵ..!

**پێنجەم:** لە حاڵێکدا دەرفەتی زەمەنی بۆ جێبەجێکردنی هەموو برگەکانی (١٤٠) نییە پێویستە کورد زۆر لە دژی دواخستنی راپرسی کۆتایی ساڵی (٢٠٠٧) نەبێ بۆ ئەوەی ئەگەر بەبریاری سیاسیی، یاخود بە بریاری پەرلەمان، دواخرا ئەوا شەرعیەتە قانونییەکەی دەمێنێتەوە. چونکە بێ جێبەجێکردنی هەنگاوەکانی ئاسایی کردنەوە راپرسی مانای نابێت‌و مەرج نییە ئاکامەکەی بەدڵی کورد بێت.

**شەشەم:** قەزای مەخمور بخرێتەوە سەر هەولێر بە مفاوەزات‌و چاوەرێی راپرسی نەکرێت، کە نەیاری نییە..!

**حەوتەم:** سەرکردایەتی کوردو حکومەتی هەرێم لەرێگەی کۆمپانیاو تەندەرەوە لە ماوەی چەند مانگێکدا لە هەریەك لەوناچانەی ململانێیان لەسەرە هەزاران یەکەی نیشتەجێبوون دروست بکەن‌و پربکرێن لە کوردی راگوێزراو بۆ ئەوەی وەکو ئەمری واقیع ژمارەی کورد لەوێ زیاتر ببێت.

**هەشتەم:** دیالۆگێکی کراوە لەنێوان کوردو بەرەی تورکمانی بکرێت بەهەر تەنازولاتێکی ئیدارییەوە لەپێناوی راکێشانیان. باشتر وایە ئەم رێگایە بەناوبژیوانی تورکیا تاقی بکرێتەوە. رەنگە ئەمە رێگایەکی دژواربێت، بەڵام عەمەلی‌و واقیعیشە، چونکە رووداوەکان سەلماندیان بێ رەزامەندی تورکمان کورد بەهیچ شێوەیەك ناتوانێ کەرکوك بەدەست بهێنێتەوە مەگەر بەشەرو خوێن‌و فرمێسك نەبێت. شتێك کەنامانەوێ جارێکی تر گەلەکەمان تووشی بێتەوە.

**نۆیەم:** سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان بریارێکی جەریئانە بدات بە دروستکردنی کابینەیەکی نوێی حکومەتی هەرێم‌و بەشدارییپێکردنی ناوچە تازە رزگارکراوەکان بە تایبەتی ئەو ناوچانەی وەرگرتنەوەیان ئاسانترو گرفت‌و نارەزایی کەمتریان لێدەکەوێتەوە، لەوانەش مەخمورو خانەقین‌و شێخان، تاوەکو خەڵکی ئەو ناوچانەش بەشداربن لە بریاری سیاسی هەرێم‌و چارەنووسی ئیداری‌و سیاسییان بە کوردستانەوە گرێبدرێت، بەراشکاوی دەیڵێین بێ تورکمان‌و کلدو ئاشووری کەرکوك، کوردستان تەنها دەبێتە وڵاتی کورد نەك وڵاتی فرە نەتەوەیی.

*** چارەسەرە هەرە خراپەکان:**

لەم بەشەدا چەند چارەسەرێکی هەرە خراپ دەخەینە بەردەست وەك جۆرێك لە سیناریۆیەکی رەش بۆ ناخۆشترین رۆژگاری بێدەستمایەیی:

**یەکەم:** دابەشکردنی کەرکوك، دانوستان.. کە ئەمەش دەکرێت کورد بە مفاوەزات لەگەڵ عەرەبەکانی ناوچەکە قسەی لەسەربکات بەبێ عەرەبی تەعریب..! بۆ نموونە بە پارێزگاکردنی حەویجە کە کە هەریەك لە زاب‌و عەباسییەو رەشادو دەشتاییەکانی نێوان حەویجە تا دووبزی بخرێتە سەر، بەمەش ژمارەیەکی زۆری عەرەب لە کەرکوك کەم دەبێتەوە.

**دووەم:** بیرکردنەوە لە بیرۆکەی دوو هەرێمی بۆ کوردستان بەمەرجی ئەوەی میساقێکی شەرەف لەنێواندا مۆربکرێت کە دوای دە ساڵ یەکبگرنەوە، کەرکوك‌و سلێمانی‌و دیالە بکرێن بە هەرێمێك‌و کورد کاریان تیابکات بۆ زیادکردنی هەیمەنەی کورد لەسەر ئەم هەرێمەو هەریەك لە هەولێرو دهۆك‌و موسڵ بکرێن بەهەرێمێکی ترو لە داهاتوودا یەکبگرنەوە.

**سێیەم:** بەپێی قانونی ئەقالیم کە لەئابی (٢٠٠٦)دا پەرلەمان پەسەندیکرد بۆ ئەوەی دوای ١٨ مانگ لەو بەرواره کاری پێدەکرێت، لەناو ساڵی (٢٠٠٨)دا. دەرگایەکی تر بەرووی کەرکوك‌و ناوچەکانی تردا والادەکرێت ئەگەر بیانەوێ ببنە هەرێمێك یان بچنەپاڵ هەرێمێکی تر، کورد ئەگەر دڵنیا نەبوو لەوەی دەیباتەوە موماتەڵەیەکی قانونی بکات تا وادەی کارپێکردنی یاسای هەرێمەکان دێت ئەوکاتەش ئەو قەدەغەیە لەسەر کەرکوك هەڵدەگیرێت کەپێشتر هاتبوو (کەرکوك‌و بەغدا) بۆیان نییە بچنە پاڵ هیچ هەرێمێك..!

**چوارەم:** ناوچەکانی ململانێ بریتین لە چەند (شار، قەزا، شارۆچکەو ئاوایی). لەکوێ ئەم قەزاو ناحێیانە دەکرێت سەرکردایەتی کوردستان ئەولەیەتی ناوچەکان دابنێت‌و بزانێت کام ناوچە پێش ناوچەیەکی تر دەکەوێت لە ئەولەویەتدا؟ دەبێ ئەو حەقیقەتە تاڵە بزانین کە رەنگە نەتوانین هەموو حەقێك بچەسپێنین‌و مەرج نییە کورد بتوانێ هەموو ناوچە کوردستانییەکانی دەستبکەوێتەوە.

**پێنجەم:** رێگای سەربازی. لە دواجاردا بەپەلاماری سەربازی کەرکوك‌و ناوچەکانی تر رزگاربکرێن کە ئەمەیان دژوارترین رێگەیە لەم قۆناغەداو دەکرێت پێی بڵێین شەری مان ونەمان.

*** بەشی چوارەم: راسپاردە گشتییەکان:**

**یەکەم:** پێویستمان بە (سەنتەرێکی ئاماری کوردستانیی) تایبەت بە کەرکوك هەیە کە وەك بانکێکی زانیاری سەیر بکرێت. بۆ سەرەتای دەستپێکی ئەم کارە دەتوانین سوود لە کۆمپانیای خۆراك وەربگرین.

**دووەم:** تەئکید کردن لەسەر جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠) زۆر پێویستە، بەڵام پێویستە ئەوە بزانین کە ئەگەری جێبەجێکردنی تەواوی برگەکانی ئەم مادەیە بەهێز نییە، بۆیە دەکرێ ئێمە لەبەردەم ئەگەرەکانی جێبەجێنەکردنی ئەم مادەیە:

١. ئەم مادەیە وەرەقەیەکی بەهێزە بۆ گفتوگۆ کردن لەسەر مەسەلەی کەرکوك، لەرێگە چارەوە بیکەینە دەسکەلا بۆ دانوستاندن وببێتە دەسکەلایەکی شەرعی بەدەست کوردەوە. پێویستە کورد بەهیچ شێوەیەك (تنازل)ی لەسەر نەکات، لەگەڵ بەهێزبوونی ئەگەرەکانی جێبەجێ نەکردن ئێمە دەبێ بەدوای بەدیل بگەڕێین لە نێو مادەی (١٤٠)دا. ئەمەش لە ڕێی کەرتکردنی بەشەکانی مادەکەوە دیاریکردنی ئەوەی کامیان دەکرێت بە بڕیاری سیاسیی عێراق چارە بکرێت‌و کامیان بە یاساو کامیان بە ئەلتەرناتیفی تر ببێتە مایەی قەرەبوکردنەوەی کورد؟ بۆ نمونە دەکرێ ئێمە لە ئێستاوە داوای دەستنیشانکردنی ناوچەی (جێی ململانێ) بکەین؟ چونکە ڕەنگە بەم شێوەیە هەندێ ناوچەمان بە ئۆتۆماتیکی بۆ بگەڕێتەوە بۆ نموونە (مەخمور). هەروەها ئەم مادەیە وەرەقەیەکی میسالییە بۆ کوردو دەکرێ مفاوەزات لەسەر هەندێ بڕگەی بکرێت لەوانەش هاوردەکان ئەگەر نەشگەڕێنەوە لەمەودا تەنها ماف (ئیقامە)یان هەیە لە هەرێم نەك دەنگدان‌و شتی تر. بۆ ئەم مەبەستە ڕەنگە لە ئاییندەدا پێویستمان بە ژووری داخراوی دانوستاندن هەبێت. ژوورێك کە لە پشتی ژووری کۆبوونەوە ڕەسمییەکانەوە بێت.

**سێیەم:** یەکێ لەو مەسەلە گرنگانەی کە وایکردوە لەلایەن عەرەبی سوننەو (تا رادەیەکیش تورکیا)وە دژایەتی ماددەی (١٤٠) بکرێت گرێدانی مەسەلەی کەرکوکە بە مەسەلەی سەروەری لە بەکارهێنانی نەوت، کورد پێویستە مەسەلەی نەوتی کەرکوك‌و سەرجەم مەسەلەکانی پەیوەند بە نەوت لە چارەنوسی ناوچە تازە ڕزگارکراوەکان جیا بکاتەوە چونکە ئەم مەسەلەیە دوژمنی زۆری بۆ دروست کردوین‌و دەکرێت لەم قۆناغەدا بیکەین بەزەمانەتی پێکەوەژیان.

**مافی نەتەوەکانی کەرکوك:**

**یەکەم:** چەند دڵنیاییەکی سەرەتایی:

١. لەسەر ئاستی کەرکوك حیوارێکی تازە لەگەڵ پێکهاتەکانی کەرکوك دەست پێبکرێت‌و لەسەر بنچینەیەکی نوێ حکومەت‌و ئیدارەی کەرکوك دروست بکرێتەوەو بەشداریان پێبکرێت.

٢. پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان دەستکاری بکرێت‌و ڕاشکاوانە کورد تایبەتمەندی کەرکوك لەبەر چاوبگرێت‌و ڕازیبێت بەوەی لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا کەرکوك موقاتەعەیەکی ئۆتۆنۆم بێت، پێکهاتەکانی کەرکوکیش لە نووسینەوەی دوا ڕەشنووسی دەستووری کوردستاندا بەشدارییان پێ بکرێت. چونکە بەداخەوە نەك تورکمانەکانی کەرکوك بەڵکو تورکمانە میانڕەوەکانی هەولێرو دۆستەکانی کوردو برایانی کلدو ئاشووری‌و بگرە هەموو کوردێکی دیموکراتخوازیش بۆنی جۆرێك لە دواکەوتوویی‌و نادیموکراسیی لەو پرۆژەیە دەکەن.

٣. ئاڵای کوردستان‌و سروودی ئەی ڕەقیب هەردووکیان بکرێن بە ئاڵاو سروودی گەلی کوردو وەك ئاڵاو سروودی نەتەوەیی کورد بمێننەوە، سروودو ئاڵایەکی نیشتمانیی بۆ گەلی کوردستان لە هەرێمی کوردستان دروستبکرێت بەلەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندی پێکهاتەکانی تری کوردستان.

٤. زمانی تورکمانی شانبەشانی عەرەبی‌و کوردی لە نوسراوەکانی ئیدارەو دەزگاکانی کەرکوکدا بەکاربهێنرێت.

٥. دەزگای زانکۆکانی کوردستان بەرووی خوێندکارانی پێکهاتە جیاوازەکانی کەرکوکدا بکرێتەوەو دەرفەت بەسەرمایەگوزاری تورکمان بدرێت لە کەرکوك‌و هەرێمدا سەرمایەگوزاری بکەن‌و بەرژەوەندییان لەگەڵ کورد دابین بکرێت.

**دووەم:** ڕێوشوێن بۆدابینکردنی مافەکان:

پێویستە هەندێ ڕێوشوێن، تەگبیر، بۆ دابینکردنی ماف ئەم نەتەوانە بگیرێتەبەر لەوانە:

١. دروست کردنی دۆخێکی تایبەت لە کەرکوك لە چوارچێوی ئۆتۆنۆمی یان هەرشێوەیەکی تری بەڕێوەبردن کە بەئاشکرا ماف خۆ بەڕێوەبردن بدات بە نەتەوەکانی تر، ئەم دۆخە تایبەتە پێویستە جۆرێك لە دابەشکردنی دائیمی پۆستەکان لەسەر نەتەوە جیاجیاکان لە خۆ بگرێ، بۆ نمونە بەردەوام پارێزگار لە نەتەوەیەك بێت‌و جێگرەکەشی هەروەها، سەرۆکی پەرلەمانی ناوخۆیی، پۆلیس، بەڕێوەبەرایەتییە گشتییەکان... هتد بەسەر نەتەوەکاندا بەیەکجاری دابەش بکرێت.

٢. ئەم دۆخە تایبەتە پێویستی بە بوونی پەرلەمانێکی ناوخۆیی هەیە کە ماف دانانی یاسای هەبێت، وا باشترە ئەم پەرلەمانە لە دوو ئەنجومەن پێك بێت، یەکێکیان لەسەر بنەمای ژمارەی دانیشتووان دابنرێت، ئەوەی تریان بەسەر سەرجەم نەتەوەکان بەیەکسانی پێك بهێنرێت‌و دابەش بکرێت.

٣. بۆ زەمانەت‌و پاراستنی ئەم دۆخە تایبەتەی کەرکوك لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستان پێویستە هەندێ زەماناتی دەستووری‌و نێودەوڵەتی بدرێتە نەتەوەکان وەك ئەوەی لە دەستووری کوردستان‌و عێراق باس بکرێت‌و شوێنی بۆ بکرێتەوە، هەروەها هەندێ لایەنی نێودەوڵەتی وەك نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەمریکا، یەکێتی ئەورووپا ببن بە زامنی پاراستنی ئەم دۆخە تایبەتە. نابێت تەنها لە ڕوانگەی ماددەی (١٤٠)وە سەیری چارەسەرییەکان بکەین، ئێمە پێویستە ئەم مادەیە بکەینە دەروازەیەك بۆ گفتوگۆ نەك بۆ لێکترازان، بۆ نمونە نەتەوەکان پێوستیان بە زەمانات هەیەو لە چوونیان بۆ ژێر دەسەڵاتی هەرێم دەترسن، کورد چی زەمانەتێکی داوە پێیان؟ پێویستە هەموو زەماناتێکی دەستووری‌و نێودەوڵەتی بدرێت پێیان، بۆ نمونە گفتوگۆ لەسەر زەمانەتی دەستووری عێراقی بۆ مافەکانیان لە کوردستان بکرێت یان ئەگەر کرا با نەتەوە یەکگرتوەکان یان یەکێتی ئەورووپا یان ئەمریکا ئەم ئەرکە بگرنە ئەستۆ، ئێمە پێویستە لەوە نەترسین کە لە ئاییندەدا چاودێر هەبێ لەسەر مامەڵە کردنمان لەگەڵ کەمینەکانی کوردستاندا.

٤. دروست کردنی گرووپێك، ڕێکخراوێك.. هتد بۆ پشتیوانی

كەركوك، ئەركی سەرەكی ئەم گرووپە ئەوە بێت كە راو بۆچوونی تازەو جیاواز لەسەر كەركوك كۆبكاتەوەو تاوتوێی بكات، ئەگرێ ئەم ئەركە بە (سەبەتەی ئەفكاری كەركوك) ناوبنێین. ئەمە دەبێت دەرفەتێكیش بۆ دەولەمەندكردنی ئەدەبیاتی سیاسیی كوردی لە باری ماف نەتەوەیی كورد وپێكەوە ژیانی نەتەوەو گرووپەكان. رەنگە بشبێتە دەرفەتێك بۆ دەولەمەندكردنی بیرورا عێراقییەكانی كە تائێستا لەوە تێناگات عێراقی بوون یەكسان نییە بە زولم و زۆرو كوردیش كە قبولێتی لە عێراقی فیدرالی بێت مانای وانییە دەستبەرداری كەركوك وسنووری هەرێمە كوردستانییەكەی دەبێت. چونكە ئەدەبیاتی سیاسیی عێراقیش لە خستنە رووی چارەسەر بۆ كێشەی ناوچەكانی جێی ململانێی لە چوارچێوەی یەك ولاتدا وەكو چۆن لە زۆر ولاتی تر هەیە، ئەدەبیاتێكی هەژارو لاوازە.

٥. دەكرێ پێشنیاری قۆناغێكی گواستنەوە (مرحلة إنتقالية) بكرێت دوای ئەوەی ریفراندۆمی لەسەر دەكرێت و پێش ئەوەی بێتەوە سەر هەرێم. لەم قۆناغەدا دەتوانین رێگا بۆ قۆناغی چوونە پال كوردستان خۆش بكەین، وەك ئەوەی ئەو تەگبیرە سیاسیانەی باسمان كرد جێبەجێ بكەین و ترسی لایەنەكان (ناوخۆو دەرەكی) لە چوونە ناو هەرێمی كوردستان كەم بكەینەوە. ئەم قۆناغە بۆ كورد زۆر گرنگە چونكە راستگۆیی بەلێنەكانی دەردەخات بەرامبەر بە نەتەوەكانی تری كەركوك. ئەم قۆناغە بەپێی پێویست دەكرێ ٢ - ٤ سال بخایەنێت.

٦. تەگبیر لە پشتیوانی ئەمەریكایی و نێودەولەتی یان هیچ نەبێت بێلایەنی لە بەرامبەر سیاسەت وهەنگاوەكانی كورد لە مەلەف كەركوكدا.

٧. دیاریكردنی مەرجەعی سیاسیی بۆ بریاردان لەسەر (دەستپێشخەرییەكانی كورد، دانوستاندنی ژوورە داخراوەكان و ئەوەی پێی دەلێن موفاوەزاتی لە حزەی ئەخیر، دروستكردنی ژووری عەمەلیاتی كەركوك كە ژوورێكی عەمەلیاتی كوردستانی و لۆكالی بێت، دواجار بۆ رەچاوكردنی سیناریۆ رەشەكانی رۆژانی رەش) دروستكردنی ئەم مەرجەعە رێ لە بەشداری میللی و نەتەوەیی كوردستانییان ناگرێت چونكە بەشداری لە ئەركە نەتەوەییەكان ماف و ئەركی هەموو هاونیشتمانییەكە. وەدەكرێت ئەم مەرجەعیەتە لە رێی كۆنگرەیەكی میللییەوە تەفویز وەربگرێت بۆ بریاردانی سیاسیی و ژوورێكی عەمەلیاتی ئیداریش دروستبكات بۆ هاوكاری و هەماهەنگی لەگەل ئەنجومەنی كەركوكدا.

٨. گرنگیدان بەلایەنی مرۆیی خەلكەكەی كەركوك كە هەمیشە بە هۆی ململانێی خاكەكەیەوە قوربانی بوون.

٩. حكومەتی هەرێم بە رەسمی بێتەوە بە شەریك لە جێبەجێكردنی مادەی (١٤٠). بۆ نموونە مالكی لە بەرنامەكەیدا خۆی پەیوەستكردووە بە جێبەجێكردنییەوەو لیژنەی بۆ داناوە. تائێستا كورد تەنها بە تەسریح قسەی لەسەر كەركوك هەیە. دەبێ بە فیعلی شەریكی جێبەجێكردنی بێت. لەم رووەوە دەكرێ حكومەتی هەرێم گەلالەی ئەو هەنگاوانە ئامادەبكات كە دەیەوێ لە كەركوك جێبەجێیان بكات.

١٠. مارشال پلانێك بۆ ئاوەدانی كەركوك و ناوچەكانی تەعریب.

١١. ئەو زەویانەی دابەشكراون بەسەر ئاوارەدا حكومەتی هەرێمی كوردستان لەماوەیەكی كورتدا هاوكاری ماددی خاوەنەكانیان بكات بۆ دروستكردنی خانوو.

١٢. دروستكردنی سەقفێك بۆ مولزەمكردنی هەموو هێزە سیاسییەكانی كورد بە هاوپەیمانی و دەرەوەی هاوپەیمانی كوردستانیشەوە.

*** دەستەی راوێژكاری لە كەركوك، تەگبیری رێگای نەجات بۆ كەركوكی دیموكرات:**

*** لاپەرەی یەكەم: پێداچوونەوە بە ماوەی رابردوودا:**

ئەم پێداچوونەوەیە هەندێك ناونیشانی گەورەت بۆ گفتوگۆ:

*** یەكەم:**

كە ئێمە پێداچوونەوە بە راستییەكانی ناو راپۆرتەكەمان دەكەین مەبەستمان نییە بلێین (نەمانوت)، لە مەسەلە نەتەوەییە گەورەكانی وەك ئەوەی كەركوكدا بەرپرسیارێتییە ئەخلاقییەكە بەرپرسیارێتییەكی گشتییە با لە ووردەكاریشدا ئەم یان ئەو كەس و لایەن زیاتر لۆمەیان بەربكەوێت، بۆیە ئەم موراجەعەیە بە خەفەتەوە دەكەین كە دەشێ بلێین خۆزگە ئێمە هەلەبواین. ئەوە كە بیروراكانمان گفتوگۆی لەسەر كراو هەندێكی رەتكرایەوە ئێمە زۆر بە ئاساییمان زانیووە، بەلام ئەوەی كە بەداخەوە هەندێك كەس ناو و ناتۆرەیان لە راپۆرتەكەمان نا خۆزگە لە داخی راپۆرتەكەی ئێمە شتێكی باشتریان دەكرد.

*** دووەم:**

پێداچوونەوەی یەكەم لە راپۆرتی كەلامی ئەهلی پەرتوك بۆ چارەی كێشەی كەركوك كە لە شوباتی سالی (٢٠٠٧)دا پێشكەشمان كرد هەلوەستەمان لەسەر گۆرینی سروشتی ماددەی (١٤٠) لە دەستووریی عێراقمان كرد، بۆیە پێداچوونەوەی یەكەم لەسەر ئەوەیە كە ماددەی (١٤٠) دەشێ لە جێبەجێكردنەوەی ببێتە دەسكەلا. ئێمە پێمان وانییە ئەم ماددە مردووە وەكو چۆن لە راپۆرتی پێشوودا پێمان وانەبوو ئەم ماددەیە هەموو شتێكە. نە كەروێشك بە عەرەبانە بگرین و نە لە ناو جامێكدا بخنكێین چی جێبەجێكراوە عەواق و چی ماوە ئیتر (١٤٠) دەتوانێ دەسكەلای كورد بێت. ماددەیەكی دەستوورییە پابەندێتی كورد بە دەستوور دەردەخات و نا پابەندێتی ئەوانی تر، نە موقەدەسە نە وەرەقەیەكی بێ نوێژە.

*** سێیەم: خراپترین سیناریۆ:**

خراپترین سیناریۆی لە خۆی هەلگرت، كە وتمان بوونی كەركوك بە هەرێمێك خراپترین سیناریۆیە ناوەكەی بە خۆیەوە بوو.

بۆیە ئێمە وەکو ئەگەر خستمانە روو نەك وەکو پرۆژەیەك ئارەزومان لێبێت، بزوتنەوەی سیاسی تەندروست ئەوەیە چەند سیناریۆیەکی لە چەکمەجەکەدا بێت و لە هەمان کاتیشدا بەرنامەی بۆ خراپترین سیناریۆ هەبێت:

– جا بۆ ئەوانەی خۆیان ئامادە کردبوو لە پرۆژەی (هەرێمی کەرکوکدا) دەسەلاتداربن و بۆ ئەوانەشی ئامادەی هیچ گفتوگۆیەك نەبوون لەسەر خراپترین سیناریۆ، دەشێ بپرسین کوا سیناریۆی رووبەرووبوونەوە؟

– ئێستا لە نەقلەیەکی نوێی شەترەنجەکەدا عەرەب و تورکمان نەك داوای (هەرێم) دەکەن کە بۆ ئێمە خراپترین سیناریۆیە، بەڵکو لە ناویشیدا (خراپترین سیناریۆی) هەرێمەکەیان هەیە: دابەشکردنی پلەو پایەو دەنگەکانی هەڵبژاردن و نوێنەرەکانی کەرکوکی یانی (دابەشکردنی دیموکراسی) کە وەك ئەوەی بەغداش نییە، چونکە ئەوەی بەغدا تەوافوقێکی تێکەڵ بە زۆرینەو کەمینەیە. کوا ئەو سیناریۆیەی کە بۆ رووبەرووبوونەوەی ئەوە پێویست بوو (اخذوا على حين غرة)؟

* چوارەم:

خراپترین ململانێ خراپترین نموونەی لێکەوتەوە:

– ململانێی دوو حیزبی گەورە.

– ململانێی ناوخۆیی یەك حیزب.

– ململانێی ئیدارەکان وا زەق بۆتەوە بەرپرسانی بەغداش هەستی پێدەکەن.

– (این منه) ململانێی سوننەو شیعە.

– جا ململانێی وامان هەبێ ململانێی دوژمنانمان بۆ چییە؟

* پێنجەم:

سیاسەتی ناسیۆنالیستی توندرەو چ زیانێکی پێگەیاندین؟ ساڵی پار لێرە ئاماژەمان بە سیاسیەتی توندرەوی نەتەوەییدا شتێك وەك ئەوەی کارتی (حیزبوللا) یی لە شێوەی (PKK)دا بەکاربێنن.

ئاکامی ئەمە لەوە ئاشکراترە ئێمە بە ئێوەی بناسێنینەوە. خەریك بوو لە کوردستان، (خەیام) وتەنی نەك شووشە شکاو، بەڵکو رەزەکەش بسووتێ. نەك کەرکوك خەریك بوو هەرێمیشی لە دەست بچێت. ئێمە لە بری ئەوە پێویستمان بە سیاسەتی میانڕەو هەیە.

* شەشەم:

سیاسەتی پێداچوونەوە بوارێکی دیکەش دەگرێتەوە کە ئامادەگی بیری شەراکەتە لە جێی مەنەلۆج وا دەشبینین بە درەنگەوە ئەم تیزە تەبەنی کراوە.

تێزی حیوار لەگەڵ تورکمان کە ئیتر ئێستا ئەو زیانەمان بۆ دەرکەوت کە ئەوانە دەتوانن لە مەسەلەی کەرکوکی بدەن.

* حەوتەم: زۆری لیژنەکانی (١٤٠)و ناکارییان:

سسترین لیژنە لیژنەی پەرلەمانی کوردستان بوو. ئەمانەی سەرەوە (ما علینا) بوو، رەخنەکانی لەسەر خۆمان بوو، ئەدی (ما علیهم) واتا پێداچوونەوەیەك بە هەڵوێستی ئەوانی تر.

– عێراق نەیتوانی ئەم پرسە جێبەجێ بکات بۆیە فاکتەری نێودەوڵەتی هاتە کایەوە. ئەوەش چەند کێشەکە ئاڵۆز دەکات، ئەوەندەش نیشانەی عەجزی دەوڵەتی عێراقە لە چارەسەری کێشەکانی خۆی.

– تورکمان بە سیاسەتی توندرەویان بە داخەوە نەیانهێشت تەیارێکی میانرەو لەناو کورددا قسەی زاڵبێت. لە جێی ئەوە بە ئەندازەی کەمبوونەوەی چانس لە بەردەم کورددا تورکمانیش چانسی روو لە کزییە، ئەڵلاهومە ئەگەر ئەم شەرەیان بۆ عەرەب کردبێت.

– ئاماژەکان دەڵێن دۆسێی تورکمان لە دەستی نەك بەرە، بەڵکو لە دەست تورکمانی سوننەش دەستێنرێ و تورکمانی شیعە جڵەو دەگرنە دەست. کە ئەمەش جۆرێکی دیکەی ناسیونالستییە زیاتر بەلای دیندا دەشکێنێتەوە تا ئەوەی بەلای نەتەوە گەراییەکی هاوچەرخدا.

سەرهەڵدانی تورکمانی شیعە کێشەی کەرکوك و چارەسەریی (تورکمانی) بۆ ئەو کێشەیە دوا دەخات، چونکە هی تورکمان لە ناو کێشە گەورەکەی شیعەی عێراقدا بزر دەکات. کاتێکی زۆری دەوێت تورکمانی شیعە لە بایەخی چارەسەری لۆکالی لەناو کەرکوك بگەن. لە بەرابەردا رۆڵی ئێران لە ناو پرسی کەرکوکدا کەمێك پەرەپێدەدا.

– کە شیعەی حکومران نەیانتوانی ئەم پرسە بۆ کورد چارەسەر بکەن بەوە عەرەبی سوننە دێنەوە مایەو لە رێی پرسی کەرکوکەوە جەمسەرگیرییەك بۆ خۆیان دروستدەکەن و لە بەرامبەر شیعەدا هێز پەیدا دەکەنەوە.

– بۆ ئەوانەی دژی هەموو دەستوەردانێکن لە کاروباری عێراق، دەردەکەوێت کە دەمارگیریان لە پرسی کەرکوکدا لەجێی ئەوەی دەستوەردان کەمبکاتەوە فاکتەری نێودەوڵەتی دێنێتەکایەوە. بێ ئومێدکردنی کورد دەنگی ماڵ جیاکردنەوە لە کوردستان بەرزتر دەکات و سەرەنجام سەرجەمی پرۆژەی عێراقی نوێ درزی تێدەکەوێت.

– داوای جیاکردنەوەی مەساری نەوت و مەساری کەرکوك داوایەکی گرووپەکەمان بوو چ بۆ کورد و چ بۆ عێراقییەکانیش جێبەجێکردنی ئەم داوایە کۆشش و زەمەنی بۆ عێراقییەکان دەگێرایەوە.

– بۆ ئەمریکاییەکان خەواندنی مەسەلەی کەرکوك:

١. کێشەیەکی دواخروی بەم ئاڵۆزییەی ئەمرۆ گەیاند.

٢. پاداشتکردنەوەی (تاوانبار) لە پرسی تەعریبدا نابێتە مایەی کەمەندکێشکردنی تاوانبارەکە بۆ رێی راستی هاوپەیمانی و لە ئەنجامیشدا قوربانیشی وەکو هاوپەیمانی لە دەست دەردەچێت.

پرسی رێککەوتنی عێراقی ئەمریکی و هەڵوێستی لایەنەکان کە هەموویان مەسافەیەك لەنێوان خۆیان و ئەمریکا دادەنێن دەریخستەوە کێ دۆستی ئەمریکایە؟ کورد یان ئەوانی تر؟ ئاوەدانکردنەوە فاکتەرێکە هەموو لایەنەکان پشتگوێی دەخەن کە ئەم ئاوەدانییە رۆڵی دەبێت لە خاوکردنەوەی ململانێکان.

*** چەند خاڵێکی گشتی:**

– جیاکردنەوەی سەنگەری خۆمان لە سەنگەری تێزەکانی گرووپی قەیرانی نێودەوڵەتی، ئێمە لە نێو کەرکوکی کوردستاندا هەمو گەمەیەك قبووڵ دەکەین بە گەمەی ئەوەی لە سنووری کەرکوکی کوردستاندا سنوورێك نەبێ بۆ ماف تورکمان و عەرەب لە هەموو بوارەکاندا، بەڵام ئەوەی بەڕێز (هیلتەرمان) دەیڵێت داوای دەستبەردانبوونە لە کەرکوك یان (خراپترین سیناریۆیەکە) هەر وەکو خراپترین ئێزیشە، چونکە لەسەر لاشەی کوردستان یارییەکە دەکات کە چی هیچ بە کورد نادات، بە هەرەشەکانی رابردوو و تراژیدیای جاران لە بنەوە کورد دەترسێنێ، بگرە هیچ سەرکۆنەی نەیارەکانی کورد ناکات کە ئەوانیش هەنگاوێك بێنە پێش.

– خراپترین سیناریۆکانی دیمستۆردا لە دەستچوونی ناوچەکان نییە، بەڵکو پرەنسیبی کارەکەیەتی کە ئەویش زاڵەو زوڵملێکراو لە یەك مەنجەڵەدا دەکوڵێنێت.

– باشی راپۆرتەکە ئەوەیە موقەدەس لە سنووریی عێراقدا ناهێڵێ و رەهەندێکی نێودەوڵەتی داداتە پرسی کورد.

– ئەزموونی چەند ساڵی رابردوو نیشانیدا کە بایکۆتکردنی هەڵبژاردن باش نییە ئەمە خویی غەیرە کورد بوو، چاوڕێ دەکرا کوردیش داوای بکات کە کورد بە زوویی رایگەیاند لەگەڵ هەڵبژاردنە ئەوانی تر کەوتنە دژی هەڵبژاردنەوە. جا پرسیار لێرە ئەوەیە ئێمە کە هەمیشە تەئکید لەسەر ئەوە دەکەینەوە گوایە هەقە بە هۆی پرسی کەرکوکەوە، پرۆسەی سیاسیی عێراق پەك بخەین ئێستا بۆچی نیگەرانین کە ئەوانی تر دەیانەوێت بە هۆی کەرکوکەوە پرۆسەی سیاسیی عێراق پەك بخەن؟ کێ بە مەسئولیەتێکی زیاترەوە هەڵسوکەوت دەکات.

*** لایەرەی دووەم: پێشنیازو چارەسەر:**

سەرەتای بیرکردنەوە لە دانانی هەر چارەسەرییەك دەبێ لەوە دەستپێبکات کە هیچ قاوغێکی حازر یان ئامادە بۆ ئەم مەسەلەیە نییە، هەر سیناریۆیەك ئەمڕۆ دایبڕێژین و پێمان وابێت کە تاقە رێگایە، لە ئایندەدا گەر بێتە دیش گۆڕانی بەسەردا دێت. ئێمە گەورەترین سەرکەوتن بۆ ئەم مەسەلەیە لە چارەسەری دەستووری دەبینین کە ماددە (١٤٠)ی دەستووری عێراق فەراهەمی کردووە، بەڵام پێویستە ئەوە لە یاد نەکەین هەر رێوشوێنێك تەنانەت دەستووری و یاسایی بێت ئەگەر نەتوانێت چارەسەری کێشەکان بکات ئەوا لە رووی عەمەلییەوە بێکەڵکە. پێویستە ئەزموونی گەلان سەبارەت بەم مەسەلەیە لە بیر نەکەین:

– فەلەستینییەکان توانییان دوای دەیان ساڵ ململانێ لەگەڵ ئیسرائیل بڕیاری ژمارە (٢٤٢) لە نەتەوە یەکگرتووەکان دەربکەن کە بەراشکاوی داوا لە ئیسرائیل دەکات لە سەرجەم خاکی داگیرکراوی پاش ساڵی (١٩٦٧) بکشێتەوە. بەڵام تاکو ئێستا ئیسرائیل جێبەجێی نەکردووە.

– کۆسۆڤۆ بە بێ بوونی هیچ بڕیارێکی نێودەوڵەتی و لەگەڵ ئەوەی هەنگاوەکەیان دژی دەستووری دەوڵەتەکەیان بوو توانییان سەربەخۆیی خۆیان بە ئیرادەی خۆیان رابگەیەنن. کەواتە لێرە مەسەلەکە تەنها دەستوورو قانوون نییە، بەڵکو هەلو مەرجی نێودەوڵەتی و ئیقلیمیش ڕۆڵی هەیە.

*** رایەك سەبارەت ماددەی (١٤٠):**

ماددەی (١٤٠) دەستوورییە، تاکو ئێستا بە هێزترین بەڵگەمانە دژ بەو کەسانەی دژایەتی بەرژەوەندییەکانمان دەکەن لە کەرکوك، ئێستاش پاش ئەوەی کە ئەم ماددەیە بەرای زۆر لە کوردیش رەنگە جێبەجێ نەکرێت بەڵکو رەنگە شێوەی تێزی دیمستۆرا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان ببێتە ئەلتەرناتیڤێك بۆ ئەم ماددەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە کورد جەغت لەسەر جێبەجێکردنی بکات بۆ ئەوەی بتوانێت شتێکی تر بەرامبەر (تنازل)کردن لە هەندێ لە بەندەکانی ئەم ماددەیە وەربگرێت.

یەکەم: هەنگاوی پێویست بۆ ئەکتیفکردنی ئەدائی سیاسی ئێستای کورد لە کەرکوك:

یەکێك لە کێشە سەرەکییەکانی بڕیاردەرانی سیاسەتی کوردی لە کەرکوك لەوەدا بووە کە بەردەوام لە حاڵەتی دیفاعی بووە بەرامبەر بە تورکمان و عەرەب، بەردەوام ناچار بووە پاساو بۆ هەڵسوکەوتەکانی بێنێتەوە، ئەم مەسەلەیە لەگەڵ هەڵەکانی جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) وایکردووە کە سیاسەتی کوردی لە کەرکوك بەرامبەر بە نەتەوەکانی تر تووشی نەزۆکی لە دەستپێشخەری بێت.

ئێمە لەم ماوەیەدا بۆ ئەکتیفکردنی سیاسەتی کوردی لە کەرکوك و بردنی بۆ چوارچێوەیەکی ئیجابی لەگەڵ دەورووبەرەکەیدا پێویستە جەغت لەسەر ئەم سیاسەتانە بکەینەوە:

– بۆ ئەوەی پێکەوە ژیان لە کەرکوك مانایەکی مەعنەوی و عەمەلی هەبێت پێویستە کورد داوا لە گرووپی عەرەبی لە کەرکوك و شوێنی تر بکات کە پەشیمانی خۆیان دەربڕن لەسەر سیاسەتی تەعریب و تەهجیر کە دژ بە کورد و تورکمان لەم شارەدا کراوە. عەرەبی کەرکوك بۆ ئەوەی خۆی وەك شەریکێکی دروستی ئەم شارە قبول بکرێت پێویستە لایەتی سایکۆلۆجی ئەم مەسەلەیە برەوێنێتەوە کە هێشتا لە یادەوەری سەرجەم کوردی کەرکوك و بەشێك لە تورکمانیش ماوەتەوە.

– بانگەشە کردن بۆ گفتوگۆی راشکاوانە و فراوان لەنێوان (نوخبە) نا سیاسییەکانی (هونەرمەند، مامۆستای زانکۆ، بازرگان، .. هتد) لە سەرجەم نەتەوە جیاجیاکانی کەرکوك. بەم شێوەیە دەکرێت کۆمیتەیەکی باڵای گفتوگۆکردن لە کەرکوك دابمەزرێت.

– بە هۆی ئەوەی زۆر جار لەلایەن نەتەوەکانی تر، بە تایبەت لەلایەن تورکمانەکانەوە، ئیدیعای ئەوە دەکرێت کە کوردێکی زۆر کە خەڵکی کەرکوك نییە هاتوونەتە کەرکوك و بەم شێوەیە کەرکوك (تەکرید) کراوە، بۆ رەتدانەوەی ئەم جۆرە ئیدیعاتانە دەکرێت کۆمیتەی گەران بە دوای راستییەکان (لجنة تقصي حقائق) تایبەت بەم مەسەلەیە لە خەڵکی بێلایەنی و پسپۆر لە سەرجەم نەتەوەکان دروست بکرێت، دەسەڵات و ماوەی

کارەکەی بۆ دەستنیشان بکرێت. دەکرێ ئەم رێو شوێنە بۆ مەسەلەی (تەعیینات) کارمەندەکانیش دەستنیشان بکرێت. ئاکامی ئەم لیژنەیە دەبێتە بەڵگە بە دەست کوردەوە.

– کورد لە کەرکوکدا پێویستی بە یەکریزی تەواو هەیە، ئەم یەکریزییە پێویستە نەك تەنها لەسەر ئاستی سیاسی بەڵکو لەسەر ئاستی نا سیاسی و لەو مەسەلانەی پەیوەندە بە بەرژەوەندی کۆمەڵگای کوردی کەرکوك، بۆ نوێنەرایەتیکردنی ئەم بەرژەوەندییانە و بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە ناسیاسییە بە جۆرێك لە جۆرەکان بەشدار بێت لە بریاردان یان بیرکردنەوە لەو بریارە چارەنووسسازانە پێویستە کوردە کەرکوکییەکان شورایەکی تایبەت بە خۆیان هەبێت کە لە توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵ (مامۆستای ئاینی، بازرگان، مقاول، مامۆستای زانکۆ، .. هتد) ئەم شورایە دەکرێت وەك لایەنێك بێت کە پێشنیار پێشکەش بە دەسەڵاتدارانی کوردی کەرکوك پێشکەش بکات و هەروەها دەتوانی هەماهەنگی لەگەڵ دەسەڵاتەکانی هەرێمی کوردستانیش بکات سەبارەت بەم مەسەلانەی کە تایبەتن بە کەرکوك.

**دووەم: سیناریۆکانی چارەسەرکردنی کێشەکان:**

لەم قۆناغەدا پێویستە چارەسەری کێشەکان لە ناوەرۆك و روحیەتی ماددەی (١٤٠) دوور نەکەوێتەوە، بەم شێوەیە جۆری مامەڵە کردنمان لەگەڵ هەر رێگەچارەیەك بۆ کەرکوك پێویستە لەم قەوارە گشتییە دوور نەکەوێتەوە.

أ. (دیمستۆرا) و مەسەلەی کەرکوك:

– سەبارەت بە مەسەلەی (دیمستۆرا) دیارە ئەو (لێکدانەوەیەی) کە بۆ قۆناغی یەکەم کردنی رەخنەیەکی زۆری لە هەمووان لەگەڵ خۆی هێنا، ئەم رەخنانە زۆر لایەنی گرتەوە کە گرنترینیان جیاوازی پێوەرەکانی چارەسەرکردن و تەنانەت نا بێلایەنی ئەو پێوەرانەی داینابوو. بەم شێوەیە پێویستە کورد بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ (دیمستۆرا) نموونەی (چارەسەرەکان هەموو بە یەکەوە) بە کاربێنێت، واتە دژی پارچەکردنی چارەسەرییەکان بێت، چونکە ئەم شێوەیە وا دەکات کە کورد تەسەورێکی نەبێت بۆ سەرجەم چارەسەری کێشەکان هەروەها ناتوانێت سەودا بکات لەسەر مەسەلە هەرە گرنگەکان و ئەوانەی تر.

– پێویستە پێوەری یەکبوونی جوگرافی، پارێزگاری کردن لە یەکێتی نەتەوەیی، پارێزگاریکردن لە یەکێتی کەمینەکان و گەشەسەندنی کلتورییان بخرێتە نێو پێوەرەکانی تری (دیمستۆرا)، هەروەها دەربارەی کەرکوك جەختکردن لەسەر ئەوەی کەرکوك خاڵی سەرەکی هاتوچۆکردنە نێوان شارەکانی کوردستان بە تایبەت هەولێر و سلێمانی، بۆیە کاتێك بیر لە چارەسەری بۆ مەسەلەی کەرکوك دادەنرێت پێویستە بەرژەوەندی هەرێمیش و ئاسۆکانی گەشەسەندنی پشتگوێ نەخرێت.

– هەموو ناوچەکانی ململانێ ناوچەی دەشتایین و ناوچەکانی ئێستای هەرێمی کوردستان زیاتر شاخاوین، هەرێمی کوردستان ئەم ناوچە دەشتییانە بە بەشێك لە ئابووری خۆی دەزانێ و ئەگەر ئەم ناوچانە لە هەرێم دابرێن ئەوا هەرێمی کوردستان زیاتر دەبێتە ناوچەیەکی شاخاوی و ئەمەش کاردەکاتە سەر گەشەسەندنی کشتوکاڵی لە هەرێمی کوردستان لەلایەك و لە خودی ئەو ناوچانە کە هەرێمی کوردستان بازاری سەرەکی ساخکردنەوەی کاڵاکانیانە.

– لە رووی نەتەوەییەوە هێشتنەوەی ئەم ناوچانە، بە کەرکوکیشەوە، لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان زیاتر لە (١ –٢) ملیۆن کورد لە پارێزگاکانی موسڵ و کەرکوك و دیالە و هەولێر دەکاتە کەمینە، بەم شێوەیە ئەم جۆرە چارەسەرییە کێشەیەکی فراوانتری کەمینەکان لە ئایندەدا دروست دەکات، بە تایبەت ئەگەر ئەم ناوچانە بە بێ رەزامەندی خەڵکەکەی لە هەرێم دووربخرێنەوە.

**ب. کەرکوك وەزعێکی تایبەتە:**

دروست کردنی وەزعێکی ئیداری و یاسایی و سیاسی تایبەت لە کەرکوك مەسەلەیەك دەکرێت وەك چارەسەرییەك بۆ مەسەلەی کەرکوك بێتە پێشەوە، دیارە ئەم دۆخە تایبەتە کاتێك بۆ کورد گرنگە کە ئەو ناوچەیە لە رووی سنووری جوگرافی و ئیدارییەوە سەر بە هەرێمی کوردستان بێت، ئەم دۆخە تایبەتە دەکرێت شێوەی (ناوچەی ئۆتۆنۆمی) لە خۆ بگرێت یان هەر دۆخێکی تر، کورد دەتوانێت لە رێگای دروست کردنی دۆخێکی تایبەت لە کەرکوکدا چەند مەسەلەیەك بپێکێ:

١. گرەنتی گێرانەوەی کەرکوك بۆ ژێر دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان.

٢. کۆتاییهاتنی کێشەی کەرکوك کە پەیوەندییەکانی کوردی لەگەڵ زۆر لایەن گرژ کردەوە.

٣. ئاساییکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ نەتەوەکانی کەرکوك بە تایبەتی تورکمان.

ج. دیارە دروست کردنی ناوچەیەکی ئۆتۆنۆم لە کەرکوك کە سەر بە هەرێمی کوردستان بێت مەسەلەیەکی ئاسان نییە مەرج نییە لەلایەن نەتەوەکانی تر پێشوازی لێبکرێت. لەم رووەوە پێویستە دەسەڵاتی کوردی هەندێ هەنگاوی عەمەلی بنێت بۆ بەخشینی متمانە بە نەتەوەکانی تر، یان لایەنی بەشێکیان قایل بکات، ئەم هەنگاوانە بریتین لە:

١. ناوچەی ئۆتۆنۆمی کەرکوك لە رووی زەماناتەوە لە دەستووری عێراق و هەرێم زامن بکرێت کە هیچ لایەنەك بێ قایلبوونی کەرکوکییەکان بۆیان نەبێت دەسکاری سنوورەکەی یان دەسەڵاتەکانی هەڵبوەشێنێتەوە.

٢. جێگیر کردن و دابەشکردنی پۆستەکان لە کەرکوك بە شێوەیەك کە چیتر مونافەسە نەیگرێتەوە سەرجەم نەتەوەکانیش تیایدا بە شێوەیەکی عادیلانە و (متوازن) نوێنەرایەتی بکرێن. ئەم دابەش کردنە حکومەتی هەرێمیش بۆی نەبێت دەخالەتی تێدا بکات.

٣. نوێنەرایەتی کردنی نەتەوەکانی تر لە سەرجەم پۆستەکانی هەرێمی کوردستان، لە حکومەت و پەرلەمان و سەرۆکایەتی هەرێم و نوێنەرایەتی هەرێم لە دەرەوە، ئەم نوێنەرایەتییە پێویستە عادیلانە و هاوسەنگ بێت و دەستوور گرنتی بکات.

**د. جارێکی تر سیناریۆ رەشەکە (هەرێمێکی سەربەخۆ لە کەرکوك):**

دیارە هەندێ لایەنی غەیرە کوردی، بە تایبەت تورکمانەکان بانگەشە بۆ هەرێمێکی سەربەخۆ بۆ کەرکوك دەکەن، ئەم هەرێمە تاکو ئێستا کورد لێی رازی نییە، بەڵام ئەگەر بێت و ئەم مەسەلەیە بوو بە واقیع دەکرێت کوردیش لەم مەسەلەیدا تەرحی خۆی هەبێ بۆ ئەم هەرێمە. ئەویش بۆ:

– چارەسەر کردنی کێشەیەك کە دەمێکە دۆخی عێراقی و ئیقلیمی کوردی لە عێراقدا گرژو ئاڵۆز کردووە.

– ئەم قۆناغە باشترە لە دۆخی ئێستا کە لە رووی ئیدارییەوە کەرکوك سەر بە بەغدایە حکومەتی بەغدا کاریگەری زۆری هەیە بەسەریدا.

لایەنە نەرێنەکانی ئەم هەرێمە:

– کەرکوك لە رووی ئیداریی و سیاسییەوە لە هەرێم جیا دەبێتەوە.

– رێژەیەکی زۆری کورد (٧٠٠ – ٨٠٠) لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان دەمێننەوە.

– کاریگەری لەسەر بەهێزی کورد لە سەرجەم عێراق جێدێڵێ. کورد بۆ کەمکردنەوەی زیانەکانی بیرۆکەی رەشی (هەرێمی سەربەخۆی کەرکوك) لەسەر بەرژەوەندی نەتەوەیی دەکرێت بەرنامەی کاری خۆی هەبێت بۆ ئەم سیناریۆیە:

– دابەشکردنی ئەم هەرێمە بۆ سەر چەندین ناوچەی جیاواز بە پێی پێکهاتەی دانیشتووان.

– دروستکردنی ناوچەی ئۆتۆنۆم لەم ناوچانەو یان هەر شێوە ئیدارەیەکی ناوخۆیی.

– ئەم شێوە ئیدارییە چەند ساڵێك بخایەنێت (٥ – ١٠) پاشان دەکرێت ریفراندۆمێك لەسەر ئاستی ناوچە ئۆتۆنۆمەکان بکرێت بۆ یەکلاکردنەوەی چارەنووسی ئیدارییان، دەچنە سەر هەرێمی کوردستان یان هەرێمێکی تریان وەك خۆیان دەمێننەوە. ئەم ریفراندۆمانە دەکرێت، وەك ئەوەی لە (کیوبك) دەکرێت، دەوری بن.

– تا مەسەلەی نەوت لە رسووی سیادییەوە یەکلا نەکرێت کێشەکانمان لە کەرکوك درەنگتر چارەسەر دەکرێت، دەبێت دەسەڵاتی کوردی یان هەر دەسەڵاتێك لە کەرکوك باڵادەست بوو ئەم مەسەلەیە بەو شێوەیە چارەسەر بکات کە نەوت سامانێکی نیشتمانییەو پێویستە لەسەر ئاستی حکومەتی مەرکەزی بەغدا سیاسەتە گشتیەکەی دیاری بکرێت.

**هـ. بەرێوەبردنی هاوبەش بۆ کەرکوك:**

دەکرێت کورد لە دۆخێکدا کە هەست بە قورسی یان ئەستەمی جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) لە کەرکوك یان هەر شێوەیەکی تری چارەسەری کە بەرژەوەندییەکانی نەپارێزی بکات، دەکرێت سەرکردایەتی کوردیش بیر لە ئیدارەی هاوبەشی کەرکوك بکات لەنێوان خۆی و حکومەتی هەرێم.

ئەم جۆرە ئیدارە هاوبەشە لایەنە باشەکانی لەوەدایە کە دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان لە کەرکوك بە رەسمی دەناسێنێ و دەتوانێ ببێتە پاڵپشتێکی گەورە بۆ کوردەکانی کەرکوك و پاراستنی مافەکانیان، بەڵام لایەنە سەلبییەکەی لەوەدایە کە شەرێکێکی گەورە بە رەسمی بۆ کورد لە کەرکوك دروست دەکات کە حکومەتی عێراقەو هەروەها کێشەکان بە یەکجاری چارەسەر ناکات بۆ گۆڕانکارییەکانی ئایندەو پارسەنگی هێز جێدێڵێ.

*** ئەنجام:**

کوردو کەرکوك لەبەردەم دووریانێکی مێژووییدان، ئێستا لە هەموو کاتێك زیاتر کات (زەمەن) لە قازانجی کوردی کەرکوك نییە، نە تەنیا لەبەر ئەوەی ماددەی (١٤٠) چەقی بەستووەو چارەسەرەکان رۆشن نین، بەڵکو چیتر کورد لە عێراق وەك (٣ – ٤) ساڵی پێشوو بەهێز نییەو ناتوانێ تەنانەت خاڵی گوشاری کشانەوەش بەکار بێنێ. بەم شێوەیە درەنگ کەوتنی چارەسەرییەکان گوشاری زیاتر دەکاتە سەر ئەجندای سیاسی کورد هەروەها قبوڵکردنی بە پەلە بە پێشنیازەکان رەنگە لەسەر حیسابی زۆر لە بەرژەوەندییەکانمان بێت، بۆیە ئێستا کورد پێویستە مامەڵە لەگەڵ زیاتر لە چارەسەرێك بکات و بەردەوام بیروبۆچوونی نوێ بۆ کێشە کۆنەکان دابرێژێتەوە، ئەم شەرە تەنها دەستنیشانی چارەنووسی ئەم ناوچانە ناکات بەڵکو لەوە زیاتر دەستنیشانی ئاست و رۆڵی کورد لە سیاسەتی ئایندەیی عێراق و ناوچەکە دەستنیشان دەکات.

*** پەراوێز:**

(*) ١. دەکرێ لێرەدا ئاماژە بەوە بکەین بەشی زۆری بریارەکانی سەردەمی بریمەر بریاری چاك و رادیکاڵ بوون، بەڵام ئێستا دەسەڵاتدارانی زاڵ لە عێراقدا ئەو یاساو بریارانەی سەردەمی بریمەر ئەگەر لە قازانجیان بێت کاری پێدەکەن و ئەگەر لە قازانجی خەڵکی تری وەکو کورد بێت ئەوە پشتگوێی دەخەن. لەناو ئەو بریارانەدا زۆر بریاری ئەوتۆیان تێدایە بریارە زاڵمانەکانی بەعس لەسەر تەعریب، تەهجیر، دەرکردن و فەسڵکردن، موسادەرەکردن هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڵام لەسەردەمی (حوکمی وەتەنی) دوای وەرگرتنەوەی سەروەریدا ئەو بریارە بریمەرییانە پەك خراون و کاریان پێ ناکرێت و لەبری ئەوەش ئەجیندای پەرلەمانی عێراق زۆری ماوە بگاتە قۆناغی دەرکردنی بریاری وا کە ئینساف راگوێزراو. لە ماڵدەرکراو زیانمەندانی بەعس بکات.

٢. کاکە رەش سدیق سەرۆکی نووسینگەی ماددەی (١٤٠) لە کەرکوك لە نووسراوێکی ئامادەکراودا دەنووسێ: (١/ بە بریاری سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق لە (٩)ی ئابی ساڵی (٢٠٠٦) لیژنەی جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) ی دەستووری عێراقی دروستکرا).

لەو رۆژەوە (١١) کۆبوونەوەی ئاسایی خۆیی ئەنجام داوە، چەندین بریاری کارگێری و مالی گرنگی ئەنجام داوە وەك:

١. دانانی ئەم لیژنانە:

أ. لیژنەی سکرتاریەت.

ب. لیژنەی (مالیة) دارایی.

ج. لیژنەی (فني) هونەری.
د. لیژنەی (تقصي الحقائق) گێرانەوەی ڕاستییەکان.
ه. لیژنەی (متابعة) بەدواداچوون.
و. کردنەوەی نووسینگەی کەرکوك، خانەقین، سنجار.
هەروەها ئەرکەکانیان بەشێوەیەکی زانستی دیاری کران.
٢. لە کۆبوونەوەی دووهەمی لیژنەی باڵا لە کەرکوکەوە زیاتر لە (١٠٠٠) بەڵگەنامەی جۆراوجۆرمان لەسەر (ئاوارە، عەرەبی هاوردە، کۆچ پێکراوان)و کێشەی موڵکایەتی پێشکەش کرد.
٣. ئەو هەنگاوانەی کە لە شاری کەرکوك ئەنجام دراوە بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە: دوو لیژنە دروست بوون بەم ناوانە:
أ. لیژنەی هونەری: ئەرکی پشکنینو گەران بەدوای بەڵگەنامەو وەسیقەکان لە ئەستۆ دەگرێت کە پێکهاتووە لە لیژنە فەرعیکانی ناو فەرمانگەکان وەك (شارەوانی، شارەوانییەکان، کشتوکاڵ، موڵکایەتی، باری شارستانی، پارێزگا) هەریەك لەم فەرمانگانە چەندین بەڵگەنامەی گرنگیان بەرزکردۆتەوە بۆ نوسینگەی کەرکوك (وەجبەی یەکەم).
ب. لیژنەی گێرانەوەی ڕاستێکان (تقصی الحقائق)، کە لە چوار ئەندامو لێپرسراوێك پێکهاتووە، ئەرکی ئەم لیژنەیە تەئکید کردنەوەیە لەسەر ئەو بەڵگەنامانەی دەگاتە دەستمان.
نوسینگەی کەرکوك بۆ جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) بەهاوکاری تێکوشەرانو ڕۆشنبیرانی شارەکە چەندین پێشنیارو میکانیزمی پێشکەش بە لیژنە باڵاکە کردەوەو لەلایەن لیژنەی باڵاوە پەسەند کراوە، دوو بڕیاری پێ دەرچووە:
١. بڕیاری یەکەم: گەرانەوەی گشت ئەو فەرمانبەرانەی بەهۆی سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزییەوە دوور خرابوونەوە بۆ پارێزگای کەرکوك.
٢. بڕیاری دووهەم: گەرانەوەی ئاوارەکان بۆ سەر زێدی باو باپیرانیان هەر خێزانێك پارچەیەك ئەرزەو (٥ بۆ ١٠) ملیۆن دینار قەرەبوو بکرێنەوە، هەر چەندە ئەم برە پارەیە زۆر کەمەوە بۆ ئەم مەبەستە داوا لە حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکەین ئاورێکی باشترو جدیتر لە ئاوارە بدرێتەوەو بە بری (٥) ملیۆن دیناری تر قەرەبویان بکاتەوە.
٣. میکانیزمی گەرانەوەی عەرەبی هاوردە بۆ شوێنی خۆیان کە لەلایەن نوسینگەی کەرکوکەوە پێشنیارکرابوو لەلایەن لیژنەی باڵاوە پەسەندکرا، بەم نزیکانە بڕیاری سێهەمی پێ وەردەگرێت).
٤. بە گوێرەی زانیارییەکان یەکێك لە گرفتەکانی ئەم هەیئەیە ئەوەیە نیسابی یاسایی لەسەر دوو دادوەری کورد یەکی کەوتووەو ئەو دادوەرانەی پێیان وتراوە بچن لەو ئەرکە یاساییو نیشتمانییەدا بەشداری بکەن لەبەر مەترسی ئەمنی بەغدا قایل نەبوون بچن.

### * پرۆژەی هەرێمی ( سەلاحەددین ):

لە ساڵی (٢٠١٣)دا یەکێك لەو پرۆژانەی کە باسی لێوەکرا باسکردن بوو لە هەرێمی (سەلاحەددین) لە چوارچێوەی ئەو ناوچانە بوو کە زیاتر سوننەنشین بوون‌و بڕیارەکەش لە ئەنجومەنی پارێزگای سەلاحەددینەوە دەرچوو، ئەم پرۆژەیە خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە هاوپەیوەستی کۆمەڵێك بنەما بوو بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی پارێزگاکەدا ئەو هەرێمە دابمەزرێت، بەڵام ئەوەی هاوپەیوەست بوو بە کەرکوکەوە بەشێك لە عەرەبی سوننەنشین بانگەوازی ئەوەیان دەکرد کە پارێزگای کەرکوکیش بلکێنن بە هەرێمی سەلاحەدینەوە، بەڵام لە چوارچێوەی ئەو نەتەوانەی کە لە کەرکوکدا بوون یان ئەو پێکهاتانەی کە کەرکوکیان پێك هێناوە لە کوردو عەرەب‌و تورکمان‌و پێکهاتەکانی تر ڕەخنەی جۆراوجۆریان لەم پرۆژەیە گرت.

بۆ نموونە یەکێك لە ئەندامەکانی پارێزگای کەرکوك کە لەسەر لیستی تورکمانی بوو بە ناوی (تەحسین کەهیە) بەرپەرچی ئەم پرۆژەیەی دایەوە لە چوارچێوەی ئەوەی کە گوایە پرۆژەیەکی کاملبوو بەرچاو نییەو ئەو بنەمایەی کە کەرکوك دەلکێنێت پێوەی بە هیچ جۆرێك لە بەرژەوەندی نە تورکمان‌و کوردو عەرەبدا نییە، بۆیە وەکو تورکمان داوای ئەوەیان دەکرد کە کەرکوك لە چوارچێوەی یەکە کارگێڕییەکانی ئێستایدا هەرێمی کەرکوك دابمەزرێت،

بەڵام عەرەبەکانی کەرکوك لەوەدا دژی وەستانەوە کە بنەمای دروستکردنی هەرێم پرۆژەیەکی ئەمریکییە لەگەڵ هاتنی ئەواندا بنەماکانی سەری هەڵداوە، بۆیە ئەوان لەو باوەڕەدان کە کەرکوك هەر وەکو پارێزگاکانی تری عێراق جیاوازی نییەو پێویست ناکات بەش بەش بکرێت.

ئەوان لەو باوەڕەدان کەرکوك لە چوارچێوەی خۆیدا بمێنێتەوەو دەسەڵاتەکانی عەرەب لەو پارێزگایەدا زیاد بکرێت، بە شێوەیەکی ئەوتۆ لەگەڵ خواستی ژمارەو پێکهاتەکەیان بگونجێت.

کورد وەکو نەتەوەیەکی گرنگ لەم شارە بەهەموو جۆرێك بەرپەچی ئەم پرۆژەیەی دایەوە ئەویش لە چوارچێوەی ئەوەی کە گوایە کەرکوك هاوپەیوەستە بە بارێکی تایبەتی‌و دیاریکراو بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە لە چوارچێوەی ماددەی (١٤٠)دا خۆی دەبینێتەوەو لە دەستووردا بە ڕوونی ئاماژەی پێ کراوە، بۆیە پێویستی بەوەیە کاری ئاسایی کردنەوەو سەرژمێری بۆ بکرێت ئەو کاتە دەتوانین لە بۆچوونی خەڵکەکەوە بڕیار لە چارەنووسی بدرێت کە ئایا لە چوارچێوەی هەرێمێکدا یان بلکێنرێت بە هەرێمی کوردستانەوە.

## * کێشەی کەرکوك.. کێشەی کوردو تورکمانە :

عارف قوربانی

ئەم بۆچوونانەی دەمەوێ لەم زنجیرە وتارەدا بیانخەمەوە روو، قەناعەتی تازەم نین، هەر لە یەکەم رۆژی چوونەوەمانەوە بۆ کەرکوك لە دوای پرۆسەی ئازادی، باوەڕم وابووە سەرباری ئەو هەموو ڕاستییە مێژووییەی دەیسەلمێنن کەرکوك شارێکی کوردستانییەو واقیعی جوگرافیی و ئامادەگی پێگەی نەتەوەیی کورد لە کەرکوك، بەڵام کورد ناتوانێ بەتەنها ببێتەوە خاوەنی ئەو شارە، نەك ئەگەر هاوپەیمان و دۆستی ئەمریکا بێت، بەڵکو ئەگەر هەموو دونیاش پشتیوانی بکات.

باشترین ڕێگەش بۆ وەرگرتنەوەی کەرکوك ئەوەیە دەبێ خەڵکێکی بەهێز لە داواکردنەوەی کەرکوك بکات بە شەریکی خۆی، بۆچوونی بەندە وابووە کە تورکمان باشترین شەریکەن کە کورد بتوانێ بە هۆیانەوە کەرکوك وەرگرێتەوە، بەڵام بەشێك لەوانەی پێچەوانەی ئەم دیدە بوون پێیانوابوو تورکمان لە هاوکێشەی کەرکوکدا بێ سەنگ و بێ کاریگەرن و جێگەی ئەوە نین بایەخیان بۆ دابنرێت، ڕایەکی تری زاڵیش ئەوەبوو کە ڕاستی پێویستی هاوبەشی کوردو تورکمانیان دەسەلماند، بەڵام بە هەڵبژاردنی ڕێگەیەکی چەوت، ئەویش لەناو تورکمانەکان هێزی سیاسی وابەستە بە کورد دروستبکرێت و هەوڵ بدرێت لە ڕێگەی ئەوانەوە تورکمان بخزێتە سەنگەری کوردەوە.

وەك داکۆکیکارێکی سەرسەخت لە تورکمان، دژی گرتنەبەری ئەو هەنگاوی حیزبی کارتۆنییە بووم و هەمیشە باوەڕم وابووە کە دەبێ لەگەڵ نوێنەرە ڕاستەقینەکانی تورکمان مامەڵە بکەین لە ناو کەرکوك، نە دروستکردنی حیزبی سێبەرو نە ڕاکردنمان بۆ تورکیا، دەرگای پێکەوەیی نێوانمان ناکەنەوە تا لەگەڵ خۆیان نەکەوینە گفتوگۆوە. ئەم هەڵوێستەو لێکەوتەکانی ئەم بیرکردنەوەیە سەرەتای خیلافەکانی بەندەو هەندێ لە خوێندەوارەکان و بەرپرسانی یەکێتیی و پارتی بووە لە کەرکوك و دەرەوەی کەرکوکیش.

گەرچی دڵنیام خەڵکی کەرکوك و خۆشبەختانە زۆرێك لەوانەشی کە دژی ئەم بۆچوونە بوون کە ئێستا هاتوونەتە سەر هەمان باوەڕ، شاهێدیی ئەم ڕاستییەم بۆ دەدەن، بەڵام لە ئایندەدا لە کتێبێکدا ئەو نامەو بەڵگەو دیدارو وتارانەی لەو چوارچێوەیەدا بۆ سەرکردایەتی سیاسی هێزە سیاسییەکان و بەرپرسانی وڵات و ئەوەی لە میدیاکاندا بۆ ڕای گشتی نوسیوومن بە کتێبێك بڵاوی دەکەمەوە.! ئەویش نەك بۆ ئەوەی خۆمان وادەربخەین کە خوێندنەوەی ئێمە بۆ کێشەی کەرکوك لە خەڵکانی تر واقیعی ترو ژیرانەتر بووە، بەڵکو تەنها لەبەر ئەوەی دوای تاقیکردنەوەی هەموو ڕێگەکانی ترو پاش بە بنبەستگەیشتنی هەندێ لەو ڕێچکانەی کورد گرتبوویەبەر، ئێستا لە هەمووکات گونجاوترە بگەڕێینەوە سەر ئەو بۆ چوونە کۆنە، کە ئێستا زەمینەی سەرکەوتنی لە جاران لەبارترە.

چی ئەوکات و دڵنیام ئێستاش هەندێ لەو خوشك و برایانەی بە هەستێکی عاتفیانەوە لە مەسەلەی کەرکوك دەڕوانن، زۆر بە توندی دژی ئەوەن کە ئێمە شەریك بۆ کورد پەیدا بکەین لە مەسەلەی کەرکوکدا، بە تایبەتیش کاتێ قسەکە وابێت کە تورکمان بکرێتە شەریك. بێگومانم لەوەی ئەم حەساسیەتەش لە خۆڕا دروست نەبووەو کاریگەری کارکردنی نەیارانی کورد لە ڕێگەی جۆراوجۆرەوە وایکردووە ئەوەندە کاریگەریی لەسەر بیرکردنەوەو سایکۆلۆجیای تاکی کورد جێبهێڵێت کە ڕقێکی لەخۆڕای لە تورکمان بێت.! بۆیە چاوەڕوانی ئەوەش دەکەم لە ئێستاشدا خەڵکانێك بەگژ ئەم بیرۆکانەدا بچنەوە.

سەرەتاش دەمەوێ باس لە پێویستی پەیداکردنی شەریکێك بکەم بۆ کورد لە مەسەلەی کەرکوکدا، تا خوێنەران بەرچاویان ڕوونتر بێت لە هەستیاری دۆخی کەرکوك و پێگەو قورسایی تورکمان لەو شارە.

من و ئێوەش وەك خوێنەرانی ئەم بابەتە دڵنیاین لە ڕەوایەتی داواکردنەوەی کەرکوك، ئەویش بە پشتبەستن بە هەزاران بیانووی شەرعی و ڕاست و ڕەوان، کە ئێمە خاوەنی کەرکوکین، بەڵام دەبێ ئەو ڕاستییە ببینین کە کەرکوکمان لێزەوت کراوە. کەواتا پێویستە بە دوای ئەو ڕێیانەدا بچین کە دەمانگەیەننەوە کەرکوك.

وەك چۆن باوەڕمان بە ڕاستی و ڕەوایەتی مافی خاوەندارێتی کردنی کەرکوك هەیە، دەبێ باوەڕمان بەوەش هەبێ واقیعێکی سەپاو هەیە ڕێ لە بەدیهێنانی خەونەکەی ئێمە دەگرێت. هێزی مەنتق و مەنتقی هێزیش پێمان دەڵێن ئەو واقیعە سەپاوە بە هێزو بازووی ئێمە بەتەنها و بە قورسایی و پێگەی خۆمان هەڵناگیرێت. خوێندنەوەی واقیعی و تا چاوی دونیا بینیشمان بڕ دەکات، دەرفەتێکی تری وا لەبەردەم خۆمان نابینین بە ئاقارێکدا بڕوات هاوکێشەکانی ناوچەکە بەو جۆرە پێچەوانە بکاتەوە کە مەیلی نەتەوەیی ئێمە بۆ کەرکوك دەیخوازێ.

لێرەوەیە ژیریی و واقیعی مەیلی گەیشتنەوە بە کەرکوك وا دەخوازێت کورد بە دوای شەریکدا بگەڕێت، لە هاوکێشەیەکی لەم جۆرەشدا کە کورد دەخوازێ شارێکی کوردی داگیرکراو لەلایەن گەلی سەردەستەی عەرەبەوە وەرگرێتەوە، بێگومان ناکرێ دەست بۆ شەراکەتی عەرەب درێژ بکات، هەردەبێ تورکمان ئەو لایەنە بێت کە دەبێتە سەنگی مەحەك بۆ یەکلایی کردنەوەی کەرکوك.

ئەمە سەرباری ئەو ڕاستییەی کە کەرکوك لە دێر زەمانەوە شارێکی کوردستان بووەو تورکمان تەمەنی هاتنیان بۆ کەرکوك لە تەمەنی پیرە دار زەیتونەکانی شارەکە کورترە، بەڵام جۆری کێشەکەی ئێستای کەرکوك و تەوقیتی هەوڵی وەرگرتنەوەی، وایکردووە کلیلەکەی لە دەستی تورکماندا بێت و بیانکاتە شەریکە بەشی کورد لە کێشەی کەرکوکدا.

گەرچی تورکمان تەنها پێکهاتەی بچووك و جیاوازی عێراق نین لە دوای هەردوو پێکهاتە سەرەکییەکەی کوردو عەرەب، ئاشوری و نەتەوەو پێکهاتەی جیاجیا هەن، بەڵام تورکمان ئەو بچووکترین پێکهاتەیەن کە گەورەترین کاریگەرییان هەیە

لە عێراقدا، ئەویش بەهۆی کێشەی کەرکوکەوە، چونکە دواجار هەڵوێستی تورکمان هاوسەنگی هاوکێشەکانی کەرکوك دەگۆڕێت و تورکمان یەکلایی دەکاتەوە کەرکوك دەگەڕێتەوە سەر ئیدارەی هەرێمی کوردستان یان سەر بە بەغدا دەمێنێتەوە. ئەویش بەهۆی ئەوەی کوردو عەرەب وەك دوو ململانێکار لەسەر کەرکوك هەردوولایان پێویستیان بە تورکمان هەیە، چونکە کورد بۆ وەرگرتنەوەی کەرکوك لە دەستی عەرەب بێگومان ناتوانێ شەراکەت لەگەڵ عەرەب دروست بکات، کاتێ ئەوە دەتوانێ ئەوە بکات کە بیر لە دابەشکردنی کەرکوك بکاتەوەو دەستبەرداری بەشێکی بێت. هەروەك عەرەبیش کە هێشتا مەیلی داگیرکاری بەری نەداون، بێگومان ناتوانن کورد بکەنە شەریك لە درێژەپێدان بەم مەیلی داگیرکارییەیان. بۆیە لێرەوەیە بایەخی پێگەی تورکمان لە کەرکوك دەردەکەوێت، سەرباری کەمی ژمارەیان بە بەراورد بە کوردو عەرەب، لە هاوکێشەکەدا لە هیچ کام لە عەرەب و کورد کەمتر نین.

زۆر هۆکارو بەرژەوەندیش هەن وا دەکەن کورد لەگەڵ تورکمان بەرەیەك پێکبهێنن بۆ وەرگرتنەوەی کەرکوك، کە لە ڕاستیدا سەرباری ئەوەی خیتابی تورکمان ئەوەبووە نەیبردۆتە سەرخۆی، بەڵام کەرکوك لەلایەن بەعس و عەرەبەوە لە کوردو تورکمان داگیرکراوە.

ڕاستە مێژووی دەرکەوتنی تورکمان بە بەراورد بە کورد مێژوویەکی تازەیە، بەڵام نزیکەی شەش سەد ساڵێکە تورکمان لە کەرکوك و هەندێ ناوچەی تری کوردستان دەژین و مێژوویەکی دوورو درێژ پێکەوەی بەستووین. لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە نزیکیی کلتوورو دابونەریتی کۆمەڵایەتی کوردو تورکمان ئەوەندە نزیکن، کەم کەس دەتوانێ بنەرەتەکەی ساغ کاتەوە موڵکی کوردن یان تورکمان.؟

سەدان خێزانی ئەو شارە دڵنیا نین لەوەی باوو باپیرەکانیان کورد بوون یان تورکمان، ئەوەندە تێکەڵ بوون و ژن و ژنخوازی بە ڕێژەیەکی زۆر لەنێواندا هەبووە. لە کاری بازرگانی و کەسابەتی بازاڕو ژیانی شوانکارەیی و کشتوکاڵکردن بە ڕادەیەکی بەرچاو ئەوەندە شەراکەت لەنێوانیاندا هەبووە بۆمان ساغ ناکرێتەوە موڵکیەتەکەی بۆ کاملا دەگەڕێتەوە.

لەڕووی ئیداریشەوە بە درێژایی مێژوویەکی دوورو درێژ کوردو تورکمان پێکەوە حوکمی کەرکوکیان کردووەو هیچ کێشەو گیروگرفتێك لەنێوانماندا نەبووە.

لەڕووی سیاسیشەوە لە زۆر مەسەلەی گرنگدا هاوهەڵوێست بووین، بەتایبەت کاتێ کۆمەڵەی گەلان ڕاپرسی ئەنجامدا بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەی ویلایەتی موسڵ، خەڵکی کەرکوك کوردو تورکمان پێکەوە هاوهەڵوێست بوون لەوەی کەرکوك نەلکێندرێت بە عێراقەوە.

بە دوای ئەوەشدا نموونەی جوانی پێکەوەژیانی ئەم دوو پێکهاتەیەی کەرکوك زۆر زۆرن و دەکرێت بکرێنە هەوێنی متمانەی گەورەتر بۆ داهاتوو.

ئەوەی لە ڕابردوودا وەك بەرژەوەندی هاوبەش لە پێکەوەبیان لە کەرکوك چی لە ڕووی سیاسی و ئیداری و کاروباری ڕۆژانەش بە دەستیانهێناوە، ئەو ماوەیەی بەعس لە سەر حوکم بووەو دوای پرۆسەش لایەنە عەرەبیەکان زۆر سوودیان لەوە بینیوە درز بخەنە نێوان کوردو تورکمانەوە. بەعس بە دروستکردنی لەمپەر لەنێوان ئەم دوو پێکهاتەیە دەیوست زەمینەی نیشتەجێکردنی عەرەب لە کەرکوك زیاتر برەخسێنێ و بەهۆی لێکدابڕینی کوردو تورکمانەوە توانی بە قۆناغ دەست بەسەر موڵك و ماڵی هەردوولادا بگرێت. زیاتر لە یەك ملیۆن دۆنم زەوی و زاری کشتوکاڵی کوردو تورکمان خرایە خزمەتی نیشتەجێکردنی عەرەبەوەو دوای پرۆسەی ئازادیش بەهۆی نارێکی و هەر یەك کەوتنە بەرەیەکەوە، کوردو تورکمان نەیانتوانی ئەم مافە زەوتکراوانەیان بەدەست بهێننەوە. کە بێگومان ئەگەر پێکەوە هاوڕاو هاو هەڵوێست بوایان هەر ساڵی یەکەمی دوای پرۆسە دەیانتوانی هەموو مافە زەوتکراوەکانیان بەدەستبهێننەوە.

کەواتا ئەگەر لە ئێستاشدا هەڵوێستەکانیان یەکبخەن و بێن بەشەریك، ئەوە لەسەر ئاستی ناوخۆی کەرکوك هەردوولا دەتوانن ماڵ و موڵکە زەوتکراوەکانیان وەرگرنەوە. دەتوانن پێکەوە دڵنیایی ئەوە بەدەست بێنن کە خۆیان حوکمی شارەکەی خۆیان بکەن و پارێزگاری لە زمان و کلتوورو سەقافەی هەردوولا بکەن و پێگەیان زیاتر لە کەرکوك بچەسپێت، پێچەوانەی ئەو خواستە شۆڤێنیەی عەرەب کە دەیانەوێ کوردو تورکمان لاواز بکەن.

ئەگەر دەستکەوتی تورکمان لە شەراکەتی لەگەڵ کورد، لەئێستاشدا لە کورد زۆرتر نەبێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە لەداهاتوویەکی دوورمەودایا سوودمەندی یەکەم تورکمان دەبێت. ئەویش بەهۆی ئەوەی تورکمان لە عێراق ساڵ لە دوای ساڵ لەبەردەم دارووخانی زیاترو پەراوێزخستنی زۆرتردایە. تەنانەت نەك لەڕووی ڕۆڵ و کاریگەریی و شەریککردنەوەی لە دەسەڵات، بەڵکو لە پاراستنی ناسنامەو مانەوەشیدا وەك نەتەوەیەك لە عێراق مەترسی گەورەی لەسەرە.

ئەگەر چەند نموونەیەك لەو ئامارانە بکەین بە پێوەر بۆ دەرخستنی ئەو ڕاستییەی وەك مەترسییەك ئاماژەمپێکرد، ئەوە بەرچاومان ڕوونتر دەبێت لەوەی تورکمان لە عێراق لەبەردەم توانەوەدایە.

سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧) بەپێی بنەما زانستییەکانی سەرژمێریی باوەڕپێکراوترین سەرژمێرییە لە عێراق، بۆیە ئەوە دەکەم بە سەرەتاو بنەمای لێکدانەوەکان. لە ساڵی (١٩٥٧) تورکمان لە تەواوی عێراقدا ژمارەیان (١٣٦,٨٠٦) بووە، کە بەپێی ڕێژەی سەدی دەکاتە (٢,١٦٪).

ساڵی (١٩٧٧) واتا بیست ساڵ دوای ئەوە ژمارەی تورکمان گەیشتۆتە (١٣٧,٢١٩) کەس، کە بەپێی ڕێژەی سەدی دەکاتە (١,١٦٪) سەدا یەك و پۆینت شانزە.

ساڵی (١٩٨٧) دوای دە ساڵیتر تورکمان ژمارەیان کەمیکردووە بۆ (١١٦,٨٤٩) کە بەپێی ڕێژەی سەدی دەکاتە (٠,٧٢٪) سەدا سفرو پۆینت حەفتا و دوو.

ساڵی (١٩٩٧) ژمارەی تورکمان کەمیکردووە بۆ (٧٢,٧٢٧) کە بەپێی ڕێژەی سەدی دەکاتە (٠,٢٨٪) سەدا سفرو پۆینت بیست و هەشت.

ئەم ئامارانە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن کە تورکمان لە عێراقدا بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن لەبەردەم هەڕەشەی سڕینەوەدان، ئەمەش چەند پەیوەندی بە سیاسەتەکانی تەعریبو ڕاگواستنەوە هەیە. زۆر لەوە زیاتر پەیوەندی بە خەسڵەتی کۆمەڵگەی تورکمان خۆیانەوەیە. بەمانای ئەوەی ئەگەر لە عێراق سیاسەتی ڕاگواستنو بەعەرەبکردن نەبوایاو هیچ جیاکارییەك لەنێوان پێکهاتەکانی عێراقدا ڕووی نەدابا، ئەوە ڕێژەی تورکمان لە عێراق ساڵ لە دوای ساڵ هەر کەمی دەکرد، ڕەنگە خێرایی کەمبوونەوەکە بەم جۆرە نەبوایا، بەڵام لە زەمەنێکی دوورتردا ڕێژەکانی هەر دەگەیشتە ئەو ئاستە ترسناکەو کەمتریش. ئەویش بەهۆی ئەوەی لە عەرەبەکانی عێراق سەر بە کۆمەڵگایەکی خێڵەکی عەرەبنو ڕێژەی زاوزێو گەشەکردنی خێزان لەناویاندا زۆر خێراو ناسروشتیە. لەبەرانبەردا تورکمان پێچەوانەی ئەم خەسڵەتەی عەرەبنو کەمترین خێزانیان بواری ئەوە دەدەن لە دوو مناڵ زیاتریان هەبێ. ئەمە وادەکات تورکمان بکەوێتە بەردەم مەترسی لەناوچوونو توانەوەوە لە ناو عەرەبدا.

لە بەشداریکردنی لە دەسەڵاتی عێراقیشدا هەمیشە فەرامۆشکراوەو ئەگەر بەشداریشی پێکرابێ، بەشدارییەکی ڕووکەشانە بووە. لە یەکەم کابینەی حوکمرانی عێراقدا بە سەرۆکایەتی عەبدولرەحمان گەیلانی نەقیب یەك وەزارەتێك دراوەتە تورکمان کە (عیزەت کەرکوکلی) وەزیری مەعاریفو تەندروستی بووە. ئیتر لەوە بەدواوە هەمیشە تورکمان وەك پێکهاتەیەکی نکولیلێکراو لە دەسەڵاتی عێراقدا هیچ بوونێکیان نەبووە تا ڕووخانی سەدامو لە یەکەم پێکهاتەی ئەنجومەنی حوکم لە عێراق (سەنگوڵ چاپوك) کرایە ئەندامی ئەنجومەنی حوکمو لەوەو بەدواش لە هەریەك لە کابینەکانی عەللاویو جەعفەریو مالیکی دا. تەنها یەك وەزیرێك دراوە بە تورکمان، ئەویش (جاسم محەمەد جەعفەر) وەزیری وەرزشو لاوان بووە. ئێستاش سەرباری مانەوەی ئەو لە پۆستەکەی خۆی، وەزارەتی دەوڵەت بۆ کاروباری پارێزگاکان دراوە بە (تورهان موفتی) کە تورکمانێکی شاری کەرکوکە.

بەڵام کاتێ تورکمان بیەوێ لەگەڵ کورد بژیو خۆی بکاتەوە بە خاوەن ئەو مافەی کە کێشەی کەرکوك بە کێشەی خۆی بزانێ شانبەشانی کورد، دەرئەنجامەکانی ئەو شەڕیك بوونەوەیە تورکمان دەکات بە هێزی دووەم لە کوردستان، چی لەڕووی ژمارەو وەك پێگەی سیاسیش.

هەرچەندە هیچ ئامارو داتایەکی پشتڕاستم لە بەردەست نییە، بەڵام باوەڕم وایە تورکمان ڕێژەیان لە کوردستان بگاتە نزیکەی (٢٠٪)ی دانیشتووانی هەرێمی کوردستانو بەوەش وەك پێکهاتەی دووەم دەبنە خاوەن ئەو ڕێژەیە لە داهاتو سەرمایەو پشکی دەسەڵات لە کوردستان.

ئەوکات یەکێك لە پۆستە باڵاکانی هەرێمی کوردستان (سەرۆکایەتی هەرێم، سەرۆکی حکومەت، سەرۆکی پەرلەمان) بۆ تورکمان دەبێت، چەندین وەزیرو بریکاری وەزیرو بەڕێوەبەری گشتیو پۆستی ناو وەزارەتو فەرمانگەکان وەردەگرن. لە پەرلەمانی کوردستانیش دەبن بەخاوەن ژمارەیەك کورسی بەرچاو لە پەرلەمانو بەو هۆیەشەوە دەتوانن بە یاسا پارێزگاری لە مافو ئیمتیازو کلتوورو شارستانیەتو زمانی خۆیان بکەن. دەرگایەك بە ڕوویاندا دەکرێتەوە کە ژیانی تورکمان پێچەوانە دەکاتەوە، لەوەی لە عێراق هەمیشە بەرەو لەناوچوون دەچن، بەڵام لە کوردستان دەکەونەوە سەر ڕێچکەی بووژاندنەوەو زیندوو دەبنەوە.

بێگومان تورکمان هەروا بە ئاسانی نایەنە سەر ئەم باوەڕەی کە بەرژەوەندییان لەگەڵ کورددایە، دەشێ باوەڕ بەو ڕاستییە بکەن کە لە عێراقدا لە بەردەم سڕینەوەدان، یان ئایندەیەکی نادیاریان هەیە، بەڵام ناتوانن هەروا باوەڕ بەم گوتارەی کوردیش بێنن کە چارەنووسیان لەگەڵ کوردو ژیانیان لە هەرێمی کوردستان، دەبێتە هۆی دۆخێکی گەش بۆ تورکمان، لە کاتێکدا ئەوان نیگەرانن لەوەی حەوت بۆ هەشت ساڵی ڕابردووی پێکەوەییمان لە کەرکوك، نەك نەبووینە پارێزەر بۆیان، بەڵکو مایەی هەڕەشەکردن بووین لەسەر ژیانو ناسنامەیان.

کاتێ کورد بگاتە ئەو ڕاستییەی کە بەبێ تورکمان نابێتەوە خاوەن کەرکوكو بەهۆو پشتیوانی ئەوانەوە دەتوانین پرۆژەی کوردی بۆ چارەسەری کەرکوك سەربخەین، کەواتا دەبێ کورد سڵ لەو ڕاستییانەش نەکاتەوە پەنجە بخەینە سەر برینەکانو هەڵەکانی خۆمان دەستنیشان بکەین، کە تەنها بە چارەسەرکردنی ئەو هەڵەو کەموکورتییانە دەتوانین پردی متمانە لەنێوان کوردو تورکمان دروستبکەینەوە، وە تا ئەو پردەش دروست نەکەین بە دڵنیاییەوە بە تایبەتی تورکمان ئامادە نابن بەشداری هیچ پرۆژەیەکی کوردی بکەن.

چونکە زۆر ڕاستی هەن لە کەرکوك بە بەرچاوی تورکمانەوە ڕوودەدەن، تا ئەو حاڵەتانەش چاك نەکەین بە وتاری سیاسیو دیداری تەلەفزیۆنو قسەی باشی ناو کۆبوونەوەکان ناتوانین، سەرنجی تورکمان ڕاکێشین. بە کوردیەکەی ئێمە پێویستمان بەوەیە لەسەر ئەرزی واقیعو بە کردەوە تورکمان بکەین بە هاوبەشی خۆمان، بەڵام ئەوان تا ئێستاش نیگەرانن لەوەی کە کورد ئەوەی بە مافی خۆی بزانێ لە عێراقو کەرکوك بە دەستی دێنێو نەك ئامادە نییە ئەو داوایە بۆ ئێمەش بە ڕەوا بزانێ، بەڵکو لێمانی زەوتدەکات.

کورد لە بەغدا ڕێژەی کورسیو دەنگەکانی ناگاتە (٢٠٪)ی دەنگو کورسییەکانی عێراق، کەچی ئیستحقاقی هەڵبژاردن فەرامۆش دەکاتو بە ئیستحقاقی نەتەوەیی لە سێ پۆستە سەرەکییەکەی بەغدا سەرۆك کۆمار وەردەگرێتو جێگری سەرۆکی پەرلەمانو جێگری سەرۆك وەزیرانو چەند وەزارەتێکی گرنگ بە مافی خۆی دەزانێ، کەچی ئامادە نییە لە کەرکوك پۆستی قایمقامێك بۆ تورکمان بسەلمێنێ.

لە کەرکوکیش لە سێ پۆستە سەرەکییەکەی پارێزگارو سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگاو قایمقام، ئامادەنین بۆ تورکمان وەك پێکهاتەیەك قایمقامێکی بدەنێ. وە بەشی زۆری بەڕێوەبەری فەرمانگەو بەڕێوەبەرێتییەکان لەنێوان پارتیو یەکێتیدا دابەشکراونو تورکمان فەرامۆش کراوە، ئیتر چۆن تورکمان باوەڕ بەو قسانە بکات کە ئەگەر دەنگ

بۆ ئەوە بدەن کەرکوك بخرێتەوە سەر ئیدارەی هەرێمی کوردستان دەستکەوت‌و ئیمتیازی گەورەیان دەبێ.

کورد پێویستە ئەو ترس‌و گومان‌و بێ متمانەییە برەوێنێتەوە، تا دڵنیایی لای تورکمان دروستببێت. ئەویش لە دوو رێگاوە دەبێت، یەکەمیان لەناو کەرکوك‌و لەسەر ئەرزی واقیع ئەو نیەت باشیەی خۆمان نیشان بدەین‌و دووەمیش کە هەر دەبێ بە کرداربێت لە دەستووری هەرێمی کوردستانەوە دەستپێبکەین ماف‌و ئیمتیازەکانی تورکمان چی دەبن، ئەوەش نەك خۆمان دانیشین‌و بۆیان بنووسین، بەڵکوو دەبێ لەگەڵ خۆیان دانیشین‌و بزانین چیان دەوێت.

ئەگەر بتوانین ئەم دوو هەنگاوە هەڵبنێین، ئومێدی ئەوە دەکرێت متمانە لای تورکمان دروستببێت بەوەی ئامادەی ئەو هاوبەشی کردنەی کوردبن. وە ئەگەر خۆمان لەو دوو راستییە بدزینەوەو بمانەوێ تەنها لە رێگەی میدیاو بە وتارو خوتبەی سیاسی دڵنیایی دروست بکەین، ئەوە بە دڵنیایەوە ئەوان ئەو قسانەمان لێناکرن.

دەشێ ئێستا کەسانێك کە ئەم وتارانە دەخوێننەوە بپرسن ئایا ئەو دەستکەوتانە چین بۆ کورد؟ تا بەهۆیەوە تورکمان بکرێتە خاوەن ماڵ لە کەرکوك‌و کوردستان. ئایا دەستکەوتەکانمان لەو هاوبەشیەی تورکمان بەشی ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ خۆمان تا لە کەرکوك‌و هەرێمدا دەستبەرداری بەشێك لە پۆستەکانی خۆمان بدەین بۆ ئەوان؟

دیارە باوەڕی بەندە وەك نووسەری ئەم باسە ئەوەیە کە کورد بە هەڵبژاردنی ئەو رێگاو شێوازانەی بۆ چارەی کێشەی کەرکوك گرتوویەتییەبەر، ناتوانێ خواستەکانی کورد بەدیبهێنێ‌و بەهۆیەوە نەك نیوەی خواستەکانی وەرناگرێتەوە، بەڵکو مەترسی ئەوەش دەکرێت بەیەکجاری کێشەکە بدۆڕێنێ. ئەویش بەهۆی ئەوەی کورد ئامادە نییە دەستبەرداری کەرکوك بێت، کە ئەوەش خواستێکی نەتەوەیی هەموو گەلی کوردەو لە گرتنەبەری رێگاکانی تر بۆ وەرگرتنەوەی کەرکوکیش رووبەرووی نەیاریی‌و هێزی عەرەب دەبێتەوە. ئەمەیە کێشەکە بەو ئاقارەدا دەبات کە کورد دواجار پێویستی بە شەرێکێکی بەهێز هەبێ لە پاراستنی ئەم بەشەی کە وەرگرتنەوەی کەرکوکە.

مەبەستی بەندە لە پەیداکردنی شەریك‌و بەخشینی بەشێك لە ماف‌و ئیمتیازەکانیشمان بە تورکمان لەو تێڕوانینەوە نییە کە پێشینان وتوویانە (زەرەر لە نێوە بگەڕێتەوە، قازانجە)!

بێگومان نەخێر، دیدی من بۆ شەریککردنەوەی تورکمان لە کێشەی کەرکوك بە چاوێکی دووربینانەترەوە لێی دەڕوانم‌و بۆ ئەوەیە بەو هۆیەوە پشتیوانە گەورەکە لەم کێشەیە بهێنینە سەرخەت، کە ئەویش دەوڵەتی تورکیایە.

دڵنیام ئێستا زۆرێك لە خوێنەران تووشی راچڵەکان‌و نیگەرانی دەبن لەوەی کەسێکی وەك بەندە پێشنیازی پەلکێشکردنی تورکیا بکات بۆ کێشەی کەرکوك. لە کاتێکدا تورکیا یەکێك بووە لە نەیارە سەرسەختەکانی گەڕانەوەی کەرکوك بۆ سەر هەرێمی کوردستان‌و گرفتی جۆراوجۆری زۆری لەبەردەم پرۆسەی ئاساییکردنەوەی کەرکوکدا دروستکردووە، دوای نزیکەی سەدەیەك لە جیاکردنەوەی ویلایەتی موسڵ، هێشتا هەر چاوی لەسەرێتی‌و خەونی لەسەر بیناکردووە.

پرسیارێکی بە جێیە ئەی ئەگەر تورکیا ئەو ملۆزمە بووە بۆ کەرکوك‌و چاوی لەسەر داگیرکردنەوەی کوردستانە، لەپای چی داوا بکرێت تورکیا بکرێتە شەریکە بەشی کورد لە کەرکوك؟

بۆ ئەوەی بۆچوونەکە روونتر بکات پێویستم بە ورووژاندنی پرسیارێکە، ئایا کورد هەر دەیەوێ بە داگیرکراوی بمێنێتەوە لە عێراق، یان بەدوای دەروازەیەکدا دەگەرێت بۆ رزگاربوون؟

دەمەوێ بڵێم ئەم بیرۆکەیە دەروازەیەکە بۆ دەربازبوون. با پرسیارەکە بەو جۆرە بێت کاتێ کوردستان لەنێوان زلهێزەکان ئەو کاتی ناوچەکەدا دابەشکرا، لەبری ئەوەی بەسەر چوار دەوڵەتدا دابەشکراوەو کراوەتە چوار پارچەوە، ئەگەر کوردستان بە یەکپارچەیی داگیربکرایا، یاخود بکرایەتە دوو پارچەی داگیرکراو باشتر نەبوو؟ بەتایبەت کە بیرۆکەکە بۆ رزگاربوونە نەك داگیرکردن!

ئەو کاتانەی ئەم بەشەی کوردستان لەژێر دەستی دەسەڵاتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بەسوتماك دەکرا، بیرۆکەیەك هەبویا کە کوردستانی عێراق بخرێتەسەر بەشەکەی تری کوردستانی تورکیا، باشتر نەبوو.؟ ئەوکات لەبری چوار پارچە، کوردستان دوو پارچەی یەکی دەگرتەوەو دەبووە سێ پارچە. دوژمن‌و نەیارێك کەمتر دەبووەوە.

باشە ئەگەر لە ئێستادا بیرۆکەی یەکخستنەوەی کوردستانی عێراق‌و کوردستانی تورکیا بخرێتە بەرباس، ئەویش نەك بەوەی ئەم بەشە ئازادەی کوردستان بچێتە ژێر رکێفی داگیرکاریيانەی تورکیاوە، بەڵکو بەو جۆرەی هەردوو بەشەکەی کوردستان لە سیستەمێکی کۆنفیدراڵی یان فیدراڵیدا بە تورکیاوە ببەسترێتەوە باشتر نییە؟

دڵنیام ئێستا دەڵێن تورکیایەك ئامادە نییە دان بە بوونی کورددا بنێ‌و بچوکترین ماف بۆ کورد بسەلمێنێ، بە کام لۆژیك زەمانەتی ئەوە دەکرێت کە تورکیا کۆنفیدراڵی یان فیدراڵی بۆ کورد قبوڵ بکات؟

ئەوە راستە، بەڵام دەبێ ئاگامان لەو راستییەش بێت کە ئێمە چەند گیرۆدەی دەستی داگیرکەرانین‌و چەند پێویستمان بە دەروازەیەکە بۆ رزگاربوون. تورکیاش لە ئێمە زیاتر پێویستی بە دەروازەیەکی لەو جۆرەیە تا بچێتە ئەورووپاوە. واتا بایەخ‌و پێویستییەکانی کورد وەك نەتەوەیەك بۆ دەوڵەت چەند زۆرو بە نرخن. لای تورکیاش گەیشتن بە ئەورووپا لەوە بایەخدارترە.

تورکیا لەوە تێگەیشتوون کە بەبێ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، دەرگای ئەوریا بەروویاندا ناکرێتەوە، ئەوەیە ئێستا ئاراستەی سیاسەتەکانی تورکیای بەو ئاقارەدا بردووە کرانەوەی بەرانبەر کێشەی کورد هەبێ‌و تا چەند ساڵێك بەر لە ئێستا بە تورکی کێوی ناوی دەبردن، ئێستا سەرۆکی وڵاتەکە لە پەرلەمان دەڵێ (ناتوانین چاومان لە ئاستی کێشەی کورد کوێر بکەین).

گرنگە ئێمە لە کوردستانی عێراق کێشەکەمان بە کێشەی کوردستانی تورکیاوە گرێ بدەین، چونکە ئومێدی چارەسەر

لەویێ نزیکترە وەك لەگەڵ عەرەب و لە عێراق.

کوردیش لەم ناوچەیە پێویستی بە دەروازەیەك هەیە تا رزگاری بێت، کە تەنها لە دۆخێکدا دەتوانێ کە نەخشەی سیاسی ناوچەکە ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێت، ئەمەش خەریکە دەبێتە مەحاڵ. بۆیە ئەگەر لە ڕێگەی گفتوگۆو لەسەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەش کوردو تورك لەسەر ئەوە ڕێککەوین چارەسەری کێشەی کورد لە تورکیا لەو ڕێگەیەوە بێت کە کورد لە عێراق جیابێتەوە و بە ڕێککەوتنێك لەنێوان هەردوولا و ناوبژیوانی نێودەولەتی لەگەڵ تورکیا بچینە ئەوروپاوە، بە مەرجی ئەوەی تورکیا رازی بێت دوای ئەوە ئێمە لە تورکیا جیا ببینەوە. ئەوکات دەبین بە وڵاتێکی ئەوروپی و ئەوروپا حیمایەمان دەکات لە مەترسی و هەڕەشەی عەرەب.

## * پرۆژەیەك بۆ چۆنێتی مامەڵەكردنی سەركردایەتی سیاسی كوردستان لە پێناوی رزگاركردنی ناوچەكانی كوردستاندا

**بۆ بەڕێز مەسعود بارزانی سەرۆكی هەرێمی كوردستان**

**عارف قوربانی**

لەو رۆژەوەی ئەم بەشەی كوردستان لكێندراوە بەعێراقی عەرەبییەوە یەكێ لەكێشە بنەڕەتییەكانی كورد لەگەڵ دەسەڵاتە یەك لەدوای یەكەكانی عێراقدا مەسەلەی دیاریكردنی سنووری جوگرافیای كوردستان بووە. هەرچەندە دوای دروستكردنی دەوڵەتی عێراق لە ساڵی (١٩٢١) ململانێ و كێشەی ویلایەتی موسڵ و دواجار دەستنیشانكردنی لیژنەیەك لە ساڵی (١٩٢٤) لەلایەن عوسبەت ئەلئومەم بۆ چارەسەركردنی كێشەكەو هاتنی وەفدەكە لە ساڵی (١٩٢٥) بۆ ناوچەكەو پاش لێكۆڵینەوەو راپرسی و گەرانەوەی وەفدەكەو پێشكەشكردنی راپۆرتەكەیان بە كۆمەڵەی گەلان كەلەرۆژی (١٦)ی كانوونی یەكەمی ساڵی (١٩٢٥) عوسبەت ئەلئومەم بریاریدا ویلایەتی موسڵ بلكێندرێ بەعێراقەوەو لە ساڵی (١٩٢٦) بریارەكە جێبەجێكراو كوردستان خرایە سەر عێراقی نوێی تازە دروستكراو. واتا دوای (٥) ساڵ لەدروستكردنی عێراق ئەوكات ئەم بەشەی كوردستانی خراوەتەسەر.. بەڵام هەر لەسەرەتاوە گرفتی بەرەسمی ناسینی سنووری جوگرافیای كوردستان و هێڵی جیاكردنەوەی لەگەڵ عەرەبستان، ململانێی لەسەر دروستبووە. لەوكاتەوە كێشەی سنوور هۆكاری سەرەكی ململانێكانی نێوان كوردو عەرەب بووە، تا سەرئەنجام ئەو رووداوانەی لێكەوتۆتەوە كەمێژوویەكی خوێناوی لەنێوان كورد و عەرەبدا دروستبێت.

كورد لەسەرەتادا رێگەی دیبلۆماسی و سیاسی هەڵبژارد بۆ بەدیهێنانی خواستو مافە نەتەوەییەكانی لەعێراقدا كەخاڵی یەكەمی داواكارییەكانی كورد خۆی لەدیاریكردنی سنووری كوردستان و بەستنەوەی هەموو ناوچەكوردییەكان بەیەكەیەكی ئیدارییەوە لەچوارچێوەی عێراقدا دەبینیەوە.

دوای ٣ ساڵ لە بەستنەوەی كوردستان بەعێراقەوە لە ساڵی (١٩٢٩) (٦)نوێنەری كورد لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق كە نوێنەرایەتی سلێمانی و كەركوك و موسڵ و هەولێریان دەكرد پێشنیازێكیان بۆ سەرۆك وەزیرانی ئەوكاتەی بەغدا (عەبدولموحسن سعدون) ناردو داوای پێكهێنانی یەك یەكەی ئیدارییان كرد بۆ هەموو كوردستان. پشتگوێخستنی داواكەش شۆرشێكی چەكداری لێكەوتەوە بەرێبەرایەتی شێخ مەحمودو شێخ ئەحمەدو مەلا مستەفا بارزانی.

جارێكیتریش لە ساڵانی (١٩٤٣)و (١٩٤٤) كە نوری سەعید سەرۆك وەزیرانی عێراق بوو، مەلا مستەفا بەناوی شۆرشی كوردەوە یاداشتنامەیەكی پێشكەش بەبەغدا كرد كەتیایدا داوای كربوو ویلایەتێكی كوردستان پێكبهێنرێت لەشارەكانی كەركوك و سلێمانی و هەولێرو ئەو شارۆچكە كوردییانەی لەهەردوو پارێزگای موسڵ و دیالەدان.

ساڵی (١٩٦٣) دوای كودەتای (٨)ی شوبات بەسەر عەبدولكەریم قاسمدا، لەشارۆچكەی كۆیە سەركردایەتی شۆرشی كورد كۆنگرەیەكی رێكخست بۆ دەستنیشانكردنی داواكارییەكانی كوردو دەستنیشانكردنی وەفدێك كەبچنە بەغداو سەر ئەنجام داواكانی كوردیان نەسەلماندو كوردیش دەستبەرداری مافەكانی نەبوو، شەڕی چەكداری دەستپێكردەوە.

لە ساڵی (١٩٧٠) جارێكیتر كورد پەنای بردەوە بەر گفتوگۆ كە تا ساڵی (١٩٧٤) بەردەوام بوو، دواجار شۆرشەكەی كورد بووە قوربانی.

لەگفتوگۆی نێوان یەكێتیی نیشتمانی كوردستان لەساڵانی (١٩٨٣)و (١٩٨٤)و رژێمی بەعسدا بەهەمان شێوە گرفتی بنەرەتی پێكنەگەیشتنەكان لەسەر دیاریكردنی تەواوی سنووری جوگرافیای كوردستان بووە.

دوای دەرفەتی راپەرین و رزگاركردنی بەشێكی گرنگ لەخاكی كوردستان لە ساڵی (١٩٩١)و لەگفتوگۆی نێوان بەرەی كوردستانی و رژێمدا بەهەمانشێوە خاڵی ناكۆكی و پێكنەگەیشتن و بەنبەست گەیشتنی گفتوگۆكان مەسەلەی كەركوك و ناوچەكانی ململانێی سنووری عەرەبستان و كوردستان بوو. بەتایبەتیش دوای راپەرین و دروستكردنی حكومەتی هەرێمی كوردستان وەك ئەمری واقیع ناوچەكانی دەرەوەی دەسەڵاتی حكومەتی هەرێم بەناوچەی ململانێ مانەوەو بۆ ئەمرۆش بەپێی دەستووری عێراقی تەنها ئەو ناوچانەی تا (١٩)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٣) لە ژێردەستی كورددا بوون بەرەسمی وەك هەرێمی كوردستان ناسراون.

گەلی كورد لەپاڵ هەوڵە دیبلۆماسی و سیاسییەكانییەوە هەموو شۆرش و راپەرینەكانیشی لەگەڵ بەرگریكردن لەمانەوەی، هەوڵی بۆ رزگاركردنی خاكی كوردستان و پاراستنی ناسنامەی نیشتمانی خاكەكەی بووە. هەرچەندە رژێمە یەك لەدوای یەكەكانی عێراق رێگاو شێوازی نامرۆڤانەو دڕندانەی جۆراوجۆریان بەكاربردووە بۆ گۆرینی باری دیمۆگرافیای كوردستان و بەتایبەتیش رژێمی بەعس هەموو داموو دەزگا دەوڵەتییەكانی لەخزمەتی پرۆسەی خەتەرناكی تەعریب و لەناوبردنی گەلی كورد بەكاربردووەو دواجار بەبەكارهێنانی چەكی یاساغی نێودەوڵەتی و بەئەنفالكردنی خەڵكی كوردستان توانیویانە واقیعی بەشێك لەو ناوچانە بگۆرن، بەڵام داكۆكی و دەستبەردار نەبوونی كورد لەبستە خاكێكی كوردستان ماناو مەغزایەكی گرنگی بەخشیووە كەهەمیشە ئومێدی گەرانەوەی رەسەنایەتی زاڵبێت بەسەر ئەو واقیعە دروستكراوەدا كەداگیركەرانی كوردستان خوڵقاندویانە.

### * پرۆسەی ئازادی و رزگاركردنی عێراق:

گەرچی تازە زەمەن ناگەرێتەوە تاپێشنیازی ئەوەبكەین چۆن سەرەتا مامەڵەمان لەگەڵ كێشە بنەرەتییەكانی كوردستاندا بكردایا، بەڵام بیرخستنەوەی هەڵەو كەموكوڕییەكان زۆرجار بۆ ئەوە بەكەڵكن كە دووبارە نەبنەوە.

بەڕێز بارزانی:

١. کورد لەکاتی پرۆسەی ئازادیدا دەیتوانی بەپەلاماری سەربازیو بەکارهێنانی هێز هەموو ئەو ناوچانە ڕزگاربکات کەپێشتر داگیرکرابوون، بەڵام موراعاتکردنی هێزە ئیقلیمیو هاوپەیمانەکان لەلایەن کوردەوە هۆکاری سەرەکی وەکخۆ مانەوەی ئاسەواری داگیرکاری بوون لەسەر ئەو ناوچانەی کوردستانو ئەو گرفتانەی ئەمڕۆ ڕووبەڕووی دەبینەوەو بۆ داهاتووش دێنە پێشمان.

٢. ترسو دڵراوکێی بەرانبەرەکانمان لەتۆڵەکردنەوەی کورد مەبەست لەو خەڵکانەیە کەبەعس وەك ئامرازی داگیرکاری بەکاریبردبوون، دەرفەتێکی تر بوو کەسەرکردایەتی کوردستان بیقۆزێتەوە بێ گرتنەبەری ڕێگای نایاساییو بێ بەکاربردنی توندووتیژی، بەپارە دەمانتوانی ئەو هێزە داگیرکەرەی سەر خاکەکەمان بنێرینەوە بەکرینەوەی ئەو خانوو موڵکانەی لەسەر خاکی کوردستان دروستیان کردبوو. واتا بەپارە کرینەوەی مافەکانی خۆمان کەلەڕابردوودا بەخوێن دەمانویست وەریانبگرینەوە.

٣. بەپەیڕەوکردنی سیاسەتێکی حەکیمانەی مەدەنیانە بۆ ئیدارەدانی ناوچە کوردستانییە تازە ڕزگاربووەکان لەدابینکردنی پێداویستییە خزمەتگوزارییەکانو پرۆژەی ژیان دۆستی بۆ خەڵکەکەی کەبەجۆرێك ڕەنگیبدایەتەوە ببوایەتە تەمەنای ئەو خەڵکانەی لەوێ دەژین کەهەمیشە کورد حوکمڕانیان بوایا، ئەمەش ڕێگایەکی تر بوو بۆ ڕزگارکردنیان، کەبێگومان ئەمەش بەدەستبەرداربوونی بەشێك لەمافەکانی هاووڵاتیانی کورد دەکرا لەو ناوچانەی کوردستاندا. لەکاتێکدا لەعێراقدا حکومەت نەما، دەرفەتێکی گونجاوبوو کورد لەهەڵبژاردنی هەرکام لەو ڕێگایانەدا سوودی لە بێ حکومەتی عێراق وەرگرتایا، کەهیچ کام لەو ڕێگایانە پەیڕەو نەکرا، پەناتان بردەبەر:

*** هەڵبژاردنی ڕێگای دەستووری:**

لەدژی ئەوەنین کەسەرکردایەتی سیاسی کوردستان ڕێگەی یاساییو دەستووری هەڵبژارد بۆ چارەسەرکردنی کێشە بنەڕتییەکەی لەگەڵ عێراقدا، بەڵام ڕەخنەی ئەوەمان هەیە کە سەرکردایەتی کورد بێ گەڕانەوە بۆ ڕای خەڵکی کوردستانو بێ خوێندنەوەیەکی ووردو ئامادەکردنی پرۆژەیەکی دراسەکراو، ئاڵۆزترین ڕێگەی دەستنیشانکرد بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی ئاڵۆز.

ڕاستە کەڕێگەی دەستووریو یاسایی گونجاوترین ڕێگەی چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانە، بەتایبەت لەدونیایی ئەمڕۆداو بۆ میللەتێکی زوڵملێکراوی وەك کورد گرنگ بوو ڕێگەچارە گونجاوەکان بدۆزینەوە، وەك چۆن بیرمەندان ئامۆژگاری مرۆڤەکان بەو شێوەیە دەکەن کەئامانجت هەرچەند پیرۆزبوو ڕێگەی چەوتی بۆ مەگرەبەر. ڕاستە کوردیش ڕێگەی چەوتی نەگرتەبەر، بەڵام دەبوو ئەوەی لەبەرچاوبێت لەگەڵ ئەوەی ڕێگەی دەستووریو یاسایی باشترین ڕێگایە بۆ چارەسەر، بەڵام بۆ چارەکردنی ئەم کێشەیەی ئێمە کە تێکەڵکێشکراوە لەگەڵ (ڕابردوو ژیانی ئەمڕۆو بۆ داهاتوو) بەوەی خەڵك، هاووڵاتی، کراوەتە ئامراز لەدروستکردنی کێشەکاندا، دەبوو ئەوەمان لەبەرچاوبێت کەدەیان یاساو ڕێسای مافی مرۆڤ دەبێتە کەندووکۆسپی یاسایی لەبەردەم چارەسەرە یاساییو دەستوورییەکاندا. بەتایبەتیش ئەوکات عەرەبە شۆڤێنییەکان لەعێراق خاوەنی هێزی سیاسی کاریگەر نەبوونو هێشتا بەرچاویان ڕوون نەبوو لەوەی ئەمریکا دەیەوێ چی بکات لەعێراقو کوردستاندا. هەڵای ئەوەیان لێبەرزبووەوە کەلەعێراقی نوێدا هەموو کەس ئازادە لەکوێ دەژیو نابێ کەس بەزۆر ڕابگوێزرێ، مەبەستیان لەوەبوو عەرەبە هاوردەکان بۆ ناو خاکی کوردستان لە شوێنی خۆیان بمێننەوە. ئەی چ جای ئەوەی هێوربونەوەی عێراق بەئاقاری بەهێزبونەوەی عەرەب لەعێراقدا دەشکایەوەو کورد دەبوو لەوە تێبگات کەدواجار دەسەڵات لە عێراق دەسەڵاتی زۆرینەیەو تێگەیشتنی هەمووشیان لەبارەی چارەنووسی کوردو کوردستانەوە دەزانین. بۆیە پێویست بوو سەرکردایەتی کورد بەرچاو ڕوونانەتر مامەڵەی لەگەڵ هەڵبژاردنی ڕێگە یاساییو دەستوورییەکاندا بکردایا، لانی کەم دەبوو بەزەمانەتو ماوەی زەمەنی دیاریکراو ڕازیبوایا کە تەرازووی هێز بەلای کورددابوو، بەڵام بەسەرەتایەکی خراپەوە دەستمان پێکرد. بێگومان هەموو سەرەتایەکی خراپ ئایندەیەکی خراپتری دێتەپێش. بەتایبەتی بۆ دیاریکردنی سنووری جیاکردنەوەی هەرێمی کوردستان، نابوو کورد بەو سیغە دەستوورییە ڕازیبوایا کەسنووری هەرێمی کوردستان بەرەسمی بەو ناوچانە دەناسێنێ کە تا (١٩)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٣) لەژێر دەستی حکومەتی هەرێمی کوردستان بووە. بەوە چارەنووسی ناوچەکانی ململانێ زیاتر کەوتنە مەترسییەوەو گەڕانەوەیانی بۆ سەر هەرێمی کوردستان ئاڵۆزتر کردووە.

*** مادەی ٥٨ لەیاسای کاتی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق:**

گەورەترین گرفت یاخود هەڵەی کوشندە ئەوەیە کەسەرکردایەتی کورد لەبێئاگاییەوە بوبێت یان زانراو، کێشەکانی کوردییان تێکەڵ بەکێشەگەلێکی تری عێراق کرد، کەڕێگەی لەبەردەم چارەسەرە یاساییو دەستوورییەکاندا بەرتەسك کردۆتەوە. ئەویش بەوەی چارەسەرکردنی کێشەی سنووری جوگرافیای کوردستانو گەڕانەوەی ماف بۆ خاوەنەکانی لەگەڕاندنەوەو نیشتەجێکردنەوەی ئاوارەو ناردنەوەی عەرەبی هاوردەو چارەسەرکردنی کێشەی موڵکداریو ڕێکخستنەوەی هەیکەلەی ئیداری شارو شارۆچکەکانی کوردستان ئەوەی بەعس بۆ مەرامیی سیاسی دەستکاریکردبوو، گەڕانەوەیان بۆ سەر ئیدارەی هەرێمی کوردستان. هەموو ئەمانەیان بەستە مادەیەکی دەستوورییەوە کەلەیاسای کاتی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراقدا لەمادەی (٥٨) ڕێوشوێنی بۆ دیاریکراوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتگیر بۆ هەموو ئەو کێشە لەیەکچوانەی عێراقە بەبێ جیاکردنەوەی کێشەکانی کورد. بێ ئەوەی دەستنیشانی سنووری جوگرافیای کوردستان بکرێت، یاخود ناوچەکانی ململانێ دیاریبکرێن. تەنها ئەوەی

لەمادەی ٥٨دا هاتووە کە سێ برگەیە (ا، ب، ج).

برگەی (ا) چوار خاڵی لەخۆگرتووە بەم شێوەیە:

ا. (حکومەتی گواستنەوەی عێراقو بەتایبەت دەستەی باڵای چارەسەرکردنی کێشەکانی موڵکایەتی خانووبەرەو لایەنە پەیوەندیدارەکانی تر بە پەلە رێوشوێن ئەگرنەبەر بۆ لابردنی ئەو زوڵمەی بە هۆی رەفتارەکانی رژێمی پێشوو روویداوە، لە گۆرینی باری دانیشتووانی چەند ناوچەیەکی دیاریکراو خۆی دەنوێنێ بە کەرکوکیشەوە لە رێگای راگواستنو دوورخستنەوەی خەڵك لە شوێنی نیشتەجێبونیانو لە رێگای کۆچپێکردنی زۆرەملێوە لەناوەو دەرەوەی ناوچەکەداو نیشتەجێکردنی خەڵکی نامۆ بەناوچەکەو بێبەشکردنی دانیشتوان لەکار لە رێگای گۆرینی نەتەوایەتی (تصحیح قومییەوە)، بۆ نەهێشتنی لەسەر حکومەتی عێراقە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بنێت).

سەبارەت بەنیشتەجێی راگوێزراوەکانو دوورخراوەو کۆچپێکراوو کۆچپێکردووەکان، بەگونجان لەگەڵ یاسای دەستەی باڵای چارەسەرکردنی کێشەکانی موڵکایەتی خانوبەرەو رێوشوێنە یاساییەکانی تر، پێویستە حکومەت لە ماوەیەکی شیاودا نیشتەجێکان بگەرێنێتەوە سەر ماڵو موڵکی خۆیان، ئەگەر ئەوەش نەتوانرا پێویستە حکومەت قەرەبوویەکی دادپەروەرانەیان بکاتەوە.

سەبارەت بەو کەسانەی هێنراون بۆ ناوچە دیاریکراوەکان پێویستە حکومەت بەپێی مادەی (١٠)ی یاسای دەستەی باڵای چارەسەری کێشەی موڵکایەتی خانوبەرە لە کێشەکەیان بکۆڵێتەوە، بۆ مسۆگەرکردنی سەرلەنوێ نیشتەجێکردنەوەیان یا زامنکردنی قەرەبوکردنەوەیان لەلایەن دەوڵەتەوە، یان ئەگەری بەخشینی زەوی تر پێیان لەلایەن دەوڵەتەوە لە نزیك شوێنی نیشتەجێبونیان لەو پارێزگایەی لێوەی هاتوون، یان قەرەبووکردنەوەی خەرجی گواستنەوەیان بۆ ئەو ناوچانە.

سەبارەت بەو کەسانەی بێبەشکراون لە دامەزراندن یا لە پێویستییەکانی گوزەران تا ناچاریان بکەن لە زێدی خۆیان کۆچبکەنو ناوچەکەو زەوییەکانیان بەجێبهێڵن، پێویستە حکومەت هانی ئەوەبدات دەرفەتی نوێی کاریان لەو ناوچەو زەویانەدا بۆ برەخسێت.

سەبارەت بەگۆرینی نەتەوایەتی، پێویستە حکومەت هەموو بریارەکانی پەیوەست هەڵبوەشێنێتەوەو رێگە بدات کەسانی زیان لێکەوتوو بە بێ زۆرلێکردنو گوشار مافی خۆیان لە دیاریکردنی ناسنامەی نەتەوەییو رەگەزی خۆیان پەیرەوبکەن.

هەردوو برگەی (ب)و (ج) بەم شێوەیەن:

ب. رژێمی پێشوو بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجی سیاسی دەستکاری سنوورە ئیدارییەکانی کردووەو گۆریوێتی، بۆیە پێویستە لەسەر ئەنجومەنی سەرۆکایەتیو حکومەتی گواستنەوەی عێراق راسپاردە پێشکەش کۆمەڵەی نیشتمانی بکەن لەپێناو چارەسەرکردنی ئەو گۆرانکارییە نارەوایانە، خۆ ئەگەر ئەنجومەنی سەرۆکایەتی نەیتوانی بەکۆی دەنگ لەسەر چەند راسپاردەیەك رێکبکەوێت، ئەوا پێویستە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی بەکۆی دەنگ ناوبژیوانێکی بێلایەن دامەزرێنێت بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەکەو پێشکەشکردنی راسپاردە، ئەگەر ئەنجومەنی سەرۆکایەتی نەیتوانی لەسەر ناوبژیوانێك رێککەوێت، ئەوا پێویستە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی داوا لە سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بکات کە کەسایەتییەکی نێودەوڵەتی ناودار بۆ ئەو ناوبژیوانییە دەستنیشان بکات.

ج. چارەسەری یەکجارەکی ئەو زەوییانەی کێشەیان لەسەرە بە کەرکوکیشەوە دوا ئەخرێت بۆ پاش جێبەجێکردنی رێوشوێنەکانی سەرەوەو ئەنجامدانی سەرژمێرییەکی داد پەروەرانەو روون (شەفاف)ی دانیشتووان، واتا تا کاتی پەسەندکردنی دەستووری هەمیشەیی. پێویستە ئەم چارەسەرە بەشێوەیەك بێت کە لەگەڵ بنەماکانی دادپەروەریدا بگونجێتو ویستی دانیشتووانی رەسەنی ئەو زەویانەیش لە بەرچاو بگیرێت.

ئەم خاڵانەی سەرەوە ئەو رێوشوێنە یاساییو دەستوورییانەیە کەکورد چاوەرێی دەکات بەهۆیەوە چارەسەری بنەرەتی کێشەکانی پێبکات، هەرچەندە لەو هەلومەرجە هەستیارەی سەردەمی نووسینەوەی یاسای کاتی بەرێوەبردنی دەوڵەتی عێراقدا کورد زۆر لە ئێستا بەهێزتربوو، عەرەب لاوازتربوون لەئێستاو لەداهاتویشدا ئەم هاوکێشەیە زیاتر لەقازانجی عەرەبدایە. باوەری زۆرینەمان وایە کەلەسەردەمی ئەنجومەنی حوکمو نووسینەوەی دەستووری کاتی عێراقدا کورد دەیتوانی رێوشوێنی باشترو ئاسانتر لەو شێوازانەی لەمادەی ٥٨دا هاتوون دیاریبکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی، بەڵام نەرمو نیانی کورد یان نەشارەزایی لەتەرحکردنی رێگەچارەی کێشەکانیدا ئەوەی لێکەوتەوە کەهیچ مومکین نییە بەو رێگەیە بتوانین هەموو سنووری جوگرافیای کوردستان بخەینەوە سەر هەرێمی کوردستان.

بەڵگەی ئەو نەشارەزاییە لەدەستنیشانکردنی رێو شوێنی یاساییدا هەر لەیاسا کاتییەکەدا دیارە، کەلەلایەك کورد داوای وەرگرتنەوەی کەرکوكو سەرجەم ئەو شاروشارۆچکانە دەکات کەکەوتونەتە سنووری پارێزگاکانی موسڵو دیالەوەو بەحسابی خۆی ئەوەی لەمادەی (٥٨) دا توانیوێتی جێبیکاتەوە ئەو نەخشەی رێگایەیە کەدەمانگەیەنێتە سەرکەوتن، بەڵام لەمادەی (٥٣)دا بە برگەی (ب، ج) کۆتێکیتری یاسایی دروستکردووە کەنەتوانین هەنگاو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان بنێن. لەبرگەی (ب)ی مادەی (٥٨) باسی دەستکاریکردنی سنووری ئیداری دەکات کە رژێمی بەعس بۆ ئامانجی سیاسی دەستکاری کردووەو رێو شوێنێکی دەستووری دەستنیشانکردووە بۆچارەکردنی. بەڵام لەبرگەی بائی مادەی ٥٣دا هاتووە سنووری ئیداری هەر هەژدە پارێزگاکەی عێراق نابێت دەستکاری بکرێنو وەك خۆیان دەمێننەوە.

کورد چاوەرێی ئەوەبووە کەبەپێی مادەی ٥٨ کار بۆ گەرانەوەی کەرکوك بۆ سەرهەرێمی کوردستان دەکات، بەڵام لەبرگەی جیم ی مادەی (٥٣)دا هاتووە (لەدەرەوەی

هەرێمی کوردستان هەر سێ پارێزگا دەتوانن ببنە هەرێمێك‌و کەرکوك‌و بەغدا ناتوانن بچنە پاڵ هیچ هەرێمێك).

ئەمە لەمپەرە دەستووری‌و یاساییەکان بوو جگە لەوەی کەحکومەتیش تا ئێستا هیچ هەنگاوێکی گرنگی نەنا بۆ ئاسانکاری جێبەجێکردنی برگەکانیتری مادەی ٥٨.

*** دەستووری هەمیشەیی‌و ئاڵۆزییەکانی مادەی ٥٨ لەمادەی ١٤٠دا:**

مادەی (٥٨) بەهەموو برگەکانییەوە گواسترایەوە بۆ ناو دەستووری هەمیشەیی عێراق‌و بووە مادەی (١٤٠)ی دەستوور، بێگومان ئەویش بەهەوڵ‌و فشارێکی زۆری کورد، کەداکۆکییەکی زۆریکرد لەوەی مادەی (٥٨) وەك خۆی بمێنێتەوە.

نووسینەوەی دەستووری هەمیشەیی دەرفەتێکی گونجاوبوو بۆ ئەوەی کورد ئەو هەڵەو کەموکورتیانە چاکبکاتەوە کەلەمادەی (٥٨)دا هەبوون، بەڵام مادەی (٥٨) بێ هیچ گۆڕانکارییەك مایەوەو خاڵی ئیجابی لە گۆڕینی یاسای کاتی بۆ دەستووری هەمیشەیی ئەوەبوو کەلەدەستوورە هەمیشەییەکەدا ناوەڕۆکی مادەی (٥٣) هەڵوەشایەوە کەپێشتر کەرکوك‌و بەغدای پابەستکردبوو بەوەی نابێ بچنە پاڵ هیچ هەرێمێك‌و ئەو برگەیەش نەما کەرێگربوو لەوەی دەستکاری یەکە ئیدارییەکانی پارێزگاکانی عێراق بکرێت، لەگەڵ ئەوەی کەدووا وادەی بۆ جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠) دانا کە لە کۆتایی (٢٠٠٧)دا بەراپرسیەك چارەنووسی ناوچەکانی ململانێ یەکلایی بکرێنەوە.

بەداخەوە کورد درکی بەوە نەکردبوو کەکێشەکانی خۆی بەستۆتە کۆمەڵا کێشەو گیروگرفتی ترەوە کەئەو رێوشوێنە یاسایی‌و دەستوورییەی دیاریکرابوو بۆ چارەسەرکردن، بەپێچەوانەوە کێشەکانی ئاڵۆزتر کردبوو وەك لەوەی کەبەتەنها داوای چارەکردنی کێشەی کورد بکات. بۆ نمونە یەکێ لەو ئاڵۆزیانە مەسەلەی یەکە ئیدارییەکانی سەر بەپارێزگای کەرکوکە وەك قەزاکانی چەمچەماڵ‌و کەلارو کفری‌و خورماتوو، بەپێی ئەو رێوشوێنە دەستوورییەی لەمادەی ١٤٠دا هاتووە دەبێ پێکەوە پرۆژەیەك پێشکەش بکرێت کەکۆی دەنگی دەستەی سەرۆکایەتی لەسەربێت بۆ رێکخستنەوەی هەموو ئەو یەکە ئیدارییانەی کەبەعس بۆ ئامانجی سیاسی دەستکاری کردووە، واتا هەرکات تکریت هەڵوەشایەوەو سامەرا خرایەوە سەر بەغداو کەی پارێزگای رومادی لەبەرییەك هەڵوەشایەوەو هەیکەلەی کەربەلا رێکخرایەوە. ئەوکاتە دەتوانرێ دووزخورماتوو بخرێتەوە سەرکەرکوك‌و چەمچەماڵ بگەرێتەوە بۆ ئیدارە کۆنەکەی. ئەمە جگە لەگرفتی دروست نەکردنی لیژنەی باڵای جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠) لە کابینەی حکومەتی جەعفەریداو پاشان تەرخان نەکردنی میزانییە بۆ ئەو قەرەبوکردنەوانەی لەمادە دەستوورییەکەدا هاتووەو بەفیڕۆدانی کات‌و موماتەڵەکردن بۆ تێپەڕینی ئەو ماوەیەی کەدەستوور بریاری لەسەرداوە وەك دواکات بۆ ئاساییکردنەوەی بارودۆخی شێوێندراوی ناوچەکانی ململانێ، تا مادەکە هێزی قانونی نەمێنێ، یاخود کێشەکە بگوێزرێتەوە بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان.

*** دیاری نەکردنی ناوچەکانی ململانێ:**

یەکێ لەو گرفتانەی تر کە لەداهاتوودا دێنەپێشمان مەسەلەی دیارینەکردنی ناوچەکانی ململانێیە، کامانەن ئەو ناوچانەی کورد بە بەشێك لەکوردستانیان دەزانێ‌و ئێستا لەدەرەوەی هەرێمی کوردستاندان، ئەگەر ئەو رێوشوێنە یاساییانەی لەدەستووردا هاتوون بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ناوچەکانی ململانێ، بێ گیروگرفت کار بەدەستوورکراو دواجار خرانە بەردەم راپرسی دانیشتووانەکەی، کورد کام ناوچە دەباتەوەو کوێ دەدۆڕێنێ؟ کەبەداخەوە وایدەبینم لەئێستادا بەپێی ئەو ئادائی کارکردنەبێت کەکورد پەیرەوی دەکات، ئەوە گەرچی نوقڵانەیەکی خراپە بەڵام لەئێستاوە دەکرێ بڵێین بەشێکی گرنگ لەخاکی کوردستان لەدەست دەچێ، لەکاتێکدا لە قۆناغە جیاجیاکانی تێکۆشاندا کورد دەستبەرداریان نەبووە. هەموویان لەخاکی کوردستاندان‌و سەردەمانێك زۆرینەی دانیشتووانەکانییان کوردبووەو بەر پاکتاوی رەگەزی کەوتوون‌و بەپەیرەوکردنی سیاسەتی شۆڤێنیانە باری دیمۆگرافیایان گۆڕاوەو دەکەونە ناو چوارچێوەی ناوچەکانی ململانێوە. کە ئەگەر بەپێی سنووری ئیداری ریزبەندیان بکەین دەکرێت بەم شێوەیە دەستنیشانی ناوچەکانی ململانێ بکرێت:

**- یەکەم:**

پارێزگای کەرکوك بەم هەیکەلە ئیدارییەی ئێستایەوە، قەزای مەرکەزی کەرکوك‌و قەزای حەویجە، قەزای داقوق، قەزای دوبز، بەناحییەو گوندەکانیانەوە، بەپێی دوا دەستکاری ئیداری‌و ئاماری ساڵی (١٩٨٧) رووبەرەکەی (١٠٣٩١) کم$^2$ یە.

**- دووەم:**

ئەو قەزاو ناحییانەی کەلەکەرکوك دابراون‌و خراونەتە سەر پارێزگاکانی تکریت‌و دیالەو سلێمانی‌و ژمارەیەکی تر قەزاو ناحییە لە پارێزگای کوت‌و دیالەو موسڵ، کەرووبەری ئەو ناوچانە زۆر لەپارێزگای کەرکوك فراوانترەو بەپێی هەموو سەرچاوە مێژوویی‌و بنەما دیمۆگرافییەکان، بەشێکی خاکی کوردستانن. کەلێرەدا ریزبەند کراون:

١. **قەزای بەدرە:** مەرکەزی قەزاو ناحییەکانی جەسان‌و زرباتییە، بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٥٧) لەگەڵ (٥٣) گوند، کەوتونەتە سنووری پارێزگای کوت. بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) رووبەرەکەی (٣٦٥٠) کم$^2$ یە.

٢. **قەزای مەندەلی:** بەپێی ئاماری (١٩٥٧) لەگەڵ ٢ناحییە بەلەدروس‌و قەزانییە، (٢٣٤) گوند، کەوتونەتە سەر پارێزگای دیالە. بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) رووبەرەکەی (٦٥٨٦) کم$^2$ یە.

٣. **قەزای خانەقین:** بەپێی ئاماری (١٩٥٧) لەگەڵ ٤ ناحییە، مەیدان‌و قۆرەتووو سەعدییەو جەلەولا، (٢٨٧) گوند، کەوتونەتە سەر پارێزگای دیالە. بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) رووبەرەکەی (٣٩١٥) کم$^2$ بووە.

٤. **قەزای کفری:** بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٥٧) لەگەڵ سێ ناحییە، قەرەتەپەو شێروانەو پێباز، رووبەرەکەی بەپێی

ئاماری (١٩٥٧) (٤٨١٢) کم² یە.

٥. **قەزای دوزخورماتوو:** لەگەڵ ناحییەکانی سلێمان بەگ، ئامرلی، نەوجول، قادرکەرەم، بەپێی بڕیارێکی کۆماری ساڵی (١٩٧٦) خراوەتە سەر تکریت، بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) رووبەرەکەی (٤٠١٩) کم² یە.

٦. **قەزای چەمچەماڵ:** لەگەڵ ناحییەکانی سەنگاوو ئاغجەلەرو تەکییە، بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٥٧) رووبەرەکەی (٢٤٥٤) کم² یە.

٧. **قەزای کەلار:** لەگەڵ ناحییەکانی تێلەکۆو پێبازو رزگاریو دەیان گوند کەلەکەرکوك جیاکرانەوەو قەزای کەلاری لێ دروستکراو خرایە سەر سلێمانی.

٨. **قەزای مەخمور:** لەگەڵ ناحییەکانی قەراج، کەندیناوا، گوێر، بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) رووبەرەکەی (٢٧٥٩) کم² یە.

٩. **قەزای حەمدانییە:** لەگەڵ ناحییەکانی بەتیلە، خدر ئەلیاس، ئاسکی کەلەك، بەپێی ئاماری (١٩٨٧) رووبەرەکەی (١١٨٨) کم² یە.

١٠. **قەزای تەلکێف:** لەگەڵ ناحییەکانی ئەلقوشو وان، سەر بەپارێزگای موسڵە، بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) رووبەرەکەی (١٢٥٧) کم² یە.

١١. **قەزای شەنگار:** لەگەڵ ناحییەکانی ئەلشیمالو قەیرەوان، بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) رووبەرەکەی (٣١٨٨) کم² یە.

١٢. **قەزای تەلعەفەر:** لەگەڵ ناحییەکانی زەممارو ئاڤگەنێو رەبیعە، سەر بەپارێزگای موسڵە، بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) رووبەرەکەی (٤٢٩٧) کم² یە.

**قەزای شێخان:** لەگەڵ ناحییەکانی مزوریو مرێبا، سەر بەپارێزگای موسڵە، بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) رووبەرەکەی (١٣٣٣) کم² یە.

*** بەستنەوەی خاك بەدڵی خەڵکەکەیەوە:**

یەکێکیتر لەو رێگە ناواقیعیو نەگونجاوانەی کەسەرکردایەتی کورد لەرێگە چارەی کێشەی ناوچەکانی ململانێدا وەك نەخشەی رێگایەك هەڵیبژارد، بەستنەوەی چارەنووسی خاك یاخود ناسنامەی خاکی بەستە دڵی دانیشتووانی سەر ئەو خاکەوە کەململانێی لەسەرە، ئەکرێت ئەمەیان بەرێگە ترسناکەکە ناوبەرین نەك نەخشەی رێگا. کەپێم وانییە لەکۆی کێشەی ئەو ناوچانەی لەدونیادا ململانێیان لەسەرە نمونەیەکی سەرکەوتوو هەبێ کەبەم شێوەیە چارەسەر کرابێت تا کورد چاوی لێبکات، نمونە زۆرن لەدونیادا لەناوخۆی یەك وڵاتدان هاوشێوەی ناوچەکانی ئێمە وەك هەرێمی دارفور لەسوداناو باسك لەئیسپانیاو باکوری خۆرهەڵاتی سریلانکاو لەنێوان دوو وڵاتیشدا کێشەی هەرێمی کەشمیر لەنێوان هیندو پاکستان، دورگەی قوبرس لەنێوان تورکیاو یۆنان، ناوچەی قەرەباغ لەنێوان ئازەربایجانو ئەرمینیاو چەندین کێشەو ململانێی تر هەیە کەلەهیچ کامیاندا پەنا بۆ رێگایەکی لەو جۆرە نەبراووە.

هەرگیز نەدەبوو سەرکردایەتی کوردیش پەنا بۆ رێگایەکی لەوجۆرە بەرێت بۆ یەکلاییکردنەوەی چارەنووسی ئەو ناوچانەی کەلەخاکی کوردستانداناو بەر پاکتاوی رەگەزی کەوتوونو واقیعی دیمۆگرافیایان گۆڕاوە. خەڵکە رەسەنەکەی دەرکراونو عەرەب هێنراونەتە شوێنەکانیانو حکومەت هەموو تواناکانی خستبووە خزمەتی ئەو پرۆسە خەتەرناکەوە. بۆیە هەڵبژاردنی رێگایەکی واپڕزەحمەت هەروا ئاسان نەبوو بۆ گەرانەوەی ئەو ناوچانە بۆ سەر هەرێمی کوردستان، بەڵام کاتێ بێ راوێژو بێ بەرنامە کورد ئەم رێگە چارەیەی پەسەندکرد، پێویستبوو هەموو تواناکانی حکومەتی هەرێمو هێزە سیاسییەکان بۆ ئەوە تەرخانبکرایا کەدڵی دانیشتووانەکەی سەر ئەو پارچە زەویانەی کوردستان بکرین کە خاکەکەمان بەستۆتە رەزامەندی دڵی ئەوانەوە. بەرەهایی دەتوانم بڵێم لەهیچ کام لەو ناوچانەدا دەسەڵاتی ئێمە، سیاسەتی ئێمە خاڵێکی سەرنج راکێش نەبوو، تاسەرنجی دانیشتووانی ئەو ناوچانە راکێشێو خۆزگەی ئەوە بخوازن بگەرێنەوە بۆ سەر هەرێمی کوردستان، ئەمە نەك تەنها ئەوانەی بەکاربرابوون وەك ئامرازی داگیرکاری. بەڵکوو دانیشتووانە رەسەنەکەی ئەو ناوچانەش کە پێکهاتەی جیاجیای ئاینیو مەزهەبیو نەتەوەیی جیاجیای تیا دەژی. سەرکردایەتی سیاسی کوردستان وەك ئەو رێگەیەی بە دوا چارەسەر هەڵبژارد دەبوو بەبەرنامەو پلانێکی وردەوە کاری بۆ ئەوەبکردایا دانیشتووانی ئەو ناوچانە ئینتیمایان بۆ هەرێمی کوردستان هەبێ، ئەویش بەبەستنەوەی بەرژەوەندیانو دروستکردنی رایەڵەی پەیوەندییەکی تووندوتۆڵ لەنێوان ئەوانو هەرێمی کوردستاندا، کردنەوەی دەرگای زانکۆو پەیمانگاکان بۆ خوێندکارانیان تالەو رێگەیەوە ئیندیماجی سۆزداریو کەلتوری دروستبێت، بوار رەخساندن بۆ خاوەن سەرمایەکانیان بەبەشداریکردن لەپرۆسەی ئابووری کوردستانداو بەشدارپێکردنیان لەشەریکاتو کۆمپانیای هاوبەش لەگەڵ سەرمایەدارانی هەرێمی کوردستاندا. تەرخانکردنی میزانییەیەکی پێویست لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە بۆ ئەو ناوچانەو خۆ بەخاوەنکردنیان بەتایبەت لەو مەسەلانەی پەیوەندی راستەوخۆی بەژیانی رۆژانەی هاووڵاتیانیانەوە هەبوو. بەڵام وا زەمەن تێپەریو ئەو ماوەیەی دیاریکراوە بۆ رازیکردنی دڵی دانیشتووانی سەر ناوچەکانی ململانێ بەدەربرینی رەزامەندیان بۆ هاتنە پاڵ هەرێمی کوردستان، بێنەوەی زەمانەتی دەنگی زۆرینەمان کردبێ وا ماوە دیاریکراوە دەستوورییەکە لەدەست ئەدەین. کە دەرفەتێکی گرنگ لەپێش کوردبوو دوای هەڵبژاردنی ئەم رێگە هەڵەیە، بۆئەوەی لەرووی یاساییەوە شەرعیەت بەوە بدات بەجۆرێك رایەڵەیەك لەنێوان ئەو ناوچانەو هەرێمی کوردستاندا دروست بکات، ئەویش بەوەی لەهەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستاندا وەك ئەمری واقیع مامەڵەی لەگەڵ بکردایاو هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان هەموو ئەو ناوچانەی بگرتایەتەوەو مافی دەنگدانیان هەبوایا بۆ پەرلەمانی کوردستانو نوێنەریان بچوایەتە پەرلەمانی کوردستانەوە، بەڵام هیچ پلانو بەرنامەیەکی لەو جۆرە

نەخرایە بەرباس و دەکرێت وەك پرۆژەیەك و دەسکەلایەك بۆ داهاتوو مامەڵەی لەگەڵ بکرێت.

* ڕێگاچارە:

یەکەم: ئازایەتی:

گەلی کورد سەربارى ئەوەی ئەمڕۆ لەهەموو قۆناغەکانی ڕابردوویی دەستکەوتی زیاتری بەدەستهێناوە، بەڵام بۆ پەڕینەوەو تێپەڕاندنی ئەم قۆناغەی تیایدا دەژی، پێش هەر شتێك پێویستی بەجورئەت هەیە لەدەستنیشانکردن و بڕیارداندا، ئەوەندەی ئێستا تێبینی دەکرێت لەمامەڵەکردنمان لەگەڵ گرفتەکاندا بەتایبەت لەگەڵ ئەو ڕێوشوێنە یاساییەی لەمادەی ١٤٠ی دەستووردا دیاریکراوە، هەموو ئاماژەکان ئەوە دەردەخەن کورد پێویستی بەوەیە بەجورئەتەوە بڕیاربدات، ئێستا تیاماون لەوەی مامەڵە لەگەڵ واقیع بکەن یان ئەو بەڵێن و ئومێدانەی لای خەڵك دروستیانکردبوو، یاخود بەدوای نەخشەی ڕێگایەکی تردا بگەڕێن.. سەرکردایەتی سیاسی کوردستان دەبێ سڵ نەکاتەوە لەوەی کام ڕێگایە زووتر دەمانگەیەنێتە ئامانج، یان کام ڕێگا کەمترین زەرەری لێدەکەین، ئەو ڕێگەیە هەڵبژێرین.. ئەمەش پێویستی بەئازایەتییە. ئازایەتی لەدۆزینەوەی ڕێگای باشترو بڕیاردان لەپەیڕەوکردنی.

دووەم: جیاکردنەوەی کێشەکان و مادەی ١٤٠:

پێویستە کورد لەئێستادا بیر لەوەبکاتەوە کێشەکانی جیابکاتەوە لەکێشەکانی تری عێراق، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بەڕێکخستنەوەی هەیکەلەی ئیداری پارێزگای کەرکوك و گەڕانەوەی قەزاکانی تری کوردستان لەپارێزگاکانی کوت و دیالەو تکریت و موسڵەوە هەیە. ڕەنگە باشترین ڕێگە کەکورد بیگرێتەبەر بۆ جیاکردنەوەی کێشەکانی، مەسەلەی پێداچوونەوەی دەستوور بێت تا بەو بیانووەوە حیوارێکی تازە دەست پێبکات لەگەڵ دەسەڵات لەعێراقدا، کەکێشەی هەندێ ناوچە هەیە تەنها بەبڕیاری سیاسی چارەسەر دەکرێن و پێویستی بەو ڕێوشوێنە دەستووریی و یاساییانە نییە کە لە مادەی (١٤٠)دا هەیە. بەتایبەتیش کە مادەی (١٤٠) پەیوەندی بەهەموو عێراقەوە هەیەو تایبەت نییە بەکێشەو ململانێی ناوچەکانی کوردستان کەلەگەڵ مەرکەز لەسەری ناکۆکین.. ئەوەیە هەڵبژاردنی ڕێگەی هەڵە لە هەڵبژاردنی ڕێگەی دەستووریداو لەدەستدانی ئەو هەلومەرجانەی دوای پرۆسەی ئازادی لەعێراقدا بۆ کورد ڕەخسان، بەشێکی پەیوەندی بەو تێکەڵکردنەی کێشەکانی کوردستانەوە بوو بەناوچەکانیتری عێراق.

سەرکردایەتی کورد ڕەزامەندی لەسەر چارەسەرێکی دیموکراسیانەو دەستووری و یاسایی دەربڕی، پێویستبوو پرۆژەیەکی گەڵاڵەکراوی هەبوایا کەلەبەندێکی دەستووری تایبەت بەململانێی ناوچەکانی کوردستان جێبکرایەتەوەو ڕێوشوێنی یاسایی بۆ چارەکردنیان دیاریبکرایا تایبەت بە کێشەکانی سنووری جوگرافیایی کوردستان و ئەو ناوچانەی کورد بە کوردستانیان ئەزانێ.. بەڵام لە ڕابردوودا ئەوەی بینیمان دەردەکەوێت لەچارەسەری دەستوورییانەدا کێشەکان بەکوێ گەیشتووە..؟ ئێستا لەنێوان پێکهاتەکانی عێراقدا گفتوگۆ لەئارادایە بۆ دەستکاریکردنی دەستوورو لەناویاندا گۆڕینی مادەی (١٤٠)، هەرچەندە تائێستا هەڵوێستەکان بەو ئاقارەن کەکورد ڕازی نابێت دەستکاری مادەی ١٤٠ بکرێت و لەدژی درێژکردنەوەی وادەی جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠)، دژی دواخستنی ڕاپرسیی کۆتایی ساڵی (٢٠٠٧)ین، بەڵام بێ ئەوەی زەمانی سەرکەوتنمان کردبێت و بێ ئەوەی تەرحێکی بەدیلمان هەبێ بۆ دوای تێپەڕبونی وادەی کۆتایی.

* بیکەر هاملتن و گرووپی قەیرانی نێودەوڵەتی و هەڵوێستی ئەمریکا:

بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کەیاسایی کاتی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق دەرچوو کە مادەی (٥٨) تایبەت بوو بەچارەسەرکردنی ناوچەکانی ململانێ و لەڕۆژی (٨)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٤) لەلایەن ئەندامانی ئەنجومەنی حوکمەوە ئیمزا کراو پاشان لەدەستووری هەمیشەییدا بووە مادەی (١٤٠)و لەڕاپرسییەکدا زۆرینەی عێراقییەکان دەنگیان بۆ داوە، تا ئێستا لەگەڵ ئەوەی بەکردار هیچ برگەیەکی ئەو مادەیە جێبەجێنەکراوە، لەیەکەم ڕۆژەوە خەڵکانێکیش نەیاری خۆیان بۆ ئەو ڕێوشوێنە دەستوورییە دەربڕی و گرفتەکان و هەوڵەکانی ئەوان پێکەوە حاڵەتەکەی گەیاندە ئەو دۆخەی کەئەمریکا ناچاربێت بۆ دەرباربوون لەو قەیرانەی لە ناوچەکە بەگشتی و عێراق بەتایبەت تێیکەوتووە، داوای پێکهێنانی گرووپێك بکات بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەکان و دەستنیشانکردنی ڕێگەچارە بۆیان، ئەوەبوو لیژنەی لێکۆڵینەوە لەکێشەکانی عێراق پێکهات لەگرووپێك کە بەگرووپی پیکەر هاملتن ناسران، ئەوەی لە برگەی (٣٠) ڕاسپاردەکانی ڕاپۆرتەکەی بیکەر هاملتن دا هاتبوو پەیوەندی بەکەرکوکەوە هەبوو، شوبهاندبوویان بە بەرمیلێك باڕووت و بۆ ڕێگرتن لەتەقینەوەی داوای دواخستنی ڕاپرسیی کۆتایی ساڵی (٢٠٠٧) کردبوو.. بێ خوێندنەوەیەکی وورد سەرکردایەتی کورد زۆر بەپەلە دژایەتی بۆ ڕاپۆرتە (١٧٠) لاپەڕەییەکەی لیژنەکە دەربڕی، تەنانەت بەئەندازەیەك ئەم نارازیبوونە ڕەنگی دایەوە کە ئەوکات حاجی کورد لەمەککە بوون، لەوێ لەسەر کێوی عەرەفە ڕێپێوانیانکرد دژی ڕاپۆرتەکەی بیکەر هاملتن، کە دەکرا سەرکردایەتی کورد لەجیاتی ئەو هەڵوێست نواندنە، هەڵوەستەی لەئاست بکردایا بەو ئاقارەی خۆی ئامادەبکات بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو واقیعە نوێیەی لەئاکامی ئەو ڕاپۆرتەوە دروست دەبێ. پاشان گرووپی ئەزەماتی دەولی هات و پاش ئەوەی ماوەیەك لە عێراق و کوردستان و کەرکوك مانەوە سەرئەنجام ڕاپۆرتێکیان پێشکەشکرد کەداوای گۆڕینی ئەو ڕێوشوێنە یاسایی و دەستوورییە دەکەن کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان دیاریکراوە. دوابەدوای ئەوە لەهەڵوێستێکی چاوەڕوان نەکراودا زالمای خەلیل زاد باڵوێزی ئەمریکا لەنەتەوە یەکگرتووەکان، هەڵوێستی ئەمریکای لەچارەسەری دەستوورییانەی کێشەی کەرکوکەوە گۆڕی بۆ داواکردن

لەنەتەوە یەكگرتووەكان كەچارەسەركردنی كێشەی كەركوك بگرنە دەست... كۆی ئەم ڕووداوو هەڵوێستانە دەمانگەیەنێتە ئەو باوەڕەی كەپێویستمان بەدۆزینەوەی میكانیزمی تازە هەیە بۆ دەستنیشانكردنی ڕێگەچارەی كێشەكانمان. كەدەكرێت كورد بۆ ئەو مەبەستە چەند ڕێوشوێنێكی تر بگرێتەبەر، لەوانە:

١. پێكهێنانی لیژنەیەكی پسپۆر بۆ ئامادەكردنی پرۆژەیەكی گەڵاڵەكراوو ئامادە بۆ ئەوەی سەركردایەتی كورد بچێتە مفاوەزاتێكی تازەوە.

٢. كاراكردنی وەزارەتـی ناوچەكانی دەرەوەی هـەرێم، بـەو ئاراستـەیـەی تـوانـای جێبـەجێـكـردنی پـرۆژەی نیشتـەجێـكـردنـەوەی ئـاوارەكـانـی هـەبێ لـەماوەیـەكی دیاریكراوی كورتخایەندا، بۆ حاڵەتی ئەگەری ڕاپرسی لەو ناوچانەداو بەر لەوادەی كۆتایی مادە دەستوورییەكە.

٣. جیاكردنەوەی كێشەی كەركوك لەكۆی ناوچەكانی تری كوردستانو پێداگری سەركردایەتی سیاسی كوردستان لـەسـەر ئـەوەی تـەواوی كێشـەكـانـی تـر بـە بـریـارێـكـی سیاسی چارەسەربكرێنو تەنها كەركوك بهێڵدرێتەوە بۆ گفتوگۆ، لەبەر ئەو هۆكارانەی كێشەكەیان بەو شێوەیە ئاڵۆزكردووە.. بۆ نمونە بەرێككەوتنێك كۆتایی بەكێشەی قەزا كوردستانییەكانی پارێزگاكانی كوتو دیالەو موسڵو تكریت بهێندرێتو ڕێوشوێنێكی دەستـووری تـازە بۆ چارەسەری كەركوك بدۆزرێتەوە. یان:

*** دەستكاریكردنی هەیكەلەی ئیداری كوردستان:**

ئەوەی لەدەستپێكی ڕێگاچارەكاندا وەك كلیلی چارەسەر بەئازایەتی ئاماژەی بۆكراوە لێرەدا زیاتر ڕەنگ دەداتەوە، كوردستـان بەسنـووری جوگرافییەكەیەوە كەبەشێكی بە هۆی ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١)وە ڕزگاركراو ئەوەی مایەوە لەژێردەستی ڕژێمی بەعسدا، بۆ ئەمرۆی دوای ڕووخانی سەدامو سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی عێراقی نوێ بووەتە گرفت، پێویستە بەرلەوەی دوژمنانمان كوردستانییەتی ئەو ناوچانە بسەلمێنن یاخود ئێمە چاوەڕێی ئەوەبین داگیركەرانی بۆمانی بسەلمێننەوە، دەبێ خۆمان هەنگاوێكی بوێرانە بنێین بۆ دروستكردنی حاڵەتی ئەمری واقیع، باشترین ڕێگایش لەحاڵەتێكی وەك ئـەمـڕۆدا ئـەوەیـە كەهەیكەلەی ئیداری شارەكانی كوردستان بگۆڕینو چەند یەكەیەكی ئیداری زیاد بكەین كەتەواوی ناوچەكانی كوردستان ببەستێتەوە بەخۆیەوە، تەنانەت ئەگەر سەركەوتویش نەبوین لەوەی ڕاستەوخۆ بیانخەینەوە ژێر دەسەڵاتی حكومەتی هەرێم، با لەپێناسەی ئیداری شارەكانی هەرێمو سنووری جوگرافیایی هەرێمو لە دەستووری هەرێمی كوردستاندا وابەستەیان بكەین بەكوردستانەوە، وەك چۆن لەدوای ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١)و پاش پێكهێنانی حكومەتی هەرێمی كوردستانو ئـامـادەكـردنـی ڕەشـنـووسـێـك بـۆ دەسـتـووری هـەرێـمـی كوردستان، كەركوك وەك پایتەختی هەرێمی كوردستان ناسرابوو هەرچەندە بەعس حوكمی دەكرد.. بەڵام ئێستا لە پـرۆژەی ڕەشـنـوسـی دەسـتـووری هـەرێـمـدا كاتێ كورد قورساییەكی بەرچاوی لە كەركوكو ناوچەكانی تردا هەیە، كەچی لە دەستووردا چارەنووسیانو سنووری جوگرافیای كوردستان بەستراوەتە بە ئەنجامی كۆتایی مادەی ١٤٠ەوە، كە بە جۆرێك لێكدانەوە ئەوە ئاماژەی دەستبەرداربوونیانە. بۆیە ئەوە بەرپرسیارێتی مێژویی لەئەستۆی سەركردایەتی سیاسی ئـەمـرۆی كـوردستـانـدایـەو پێویستە بریارێكی بوێرانـەی هەبێ بۆ دەستكاریكردنی هەیكەلەی ئیداری كوردستانو دروستكردنی چەند كانتۆنێكی ئیداری لە چوارچێوەی هـەرێمی كوردستانداو دانـانـی میكانیزمێك بۆ مـامـەڵـە كـردنـی ڕاسـتـەوخـۆیـان بەحكومەتی هـەرێمی كوردستانەوە. وەك:

**- بە پارێزگا كردنی خانەقینو كردنی بەیەكەیەكی ئیداری ئۆتۆنۆم بۆ فەیلییەكانی كوردستان:**

دەستنیشانكردنی ڕێگەچارەی كێشەكان كۆڵەكەی چارەسەركردنە، ئێمە دەبێ دان بەو ڕاستییەدا بنێین لەرابردوودا دوای پرۆسەی ئازادی عێراقو كردنەوەی دەرگایەك بەرووی کورددا بۆ چارەسەركردنی كێشەی سنووری جوگرافیاو ناوچەكانی ململانێی، ڕێگەیەكی هەڵەمان هەڵبژارد یان هیچ نەبێ دەبێ ئەوە بسەلمێنین كەبەهەڵە تەرحی كێشەكانمان كرد.. بۆیە دەبینی مەترسییەكی زۆر لەسەر لەدەستچوونی زۆرترین سنووری جوگرافیای كوردستانمان هەیە، كەلەرابردوودا كورد بەخوێن بەخشین دەستی لێیان هەڵنەگرتووە، وەك قەزای بەدرە، ناحییەی جەسانو زرباتییە، كە بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٥٧) لەگەڵ (٥٣) گوند، كەوتونەتە سنووری پارێزگای كوت. بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) ڕووبەرەكەی (٣٦٥٠) كم٢ یە. قەزای مەندەلی، بەپێی ئاماری (١٩٥٧) لەگەڵ ٢ ناحییە بەلەدروسو قەزانییە، (٢٣٤) گوند، كەوتوونەتە سەر پارێزگای دیالە. بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) ڕووبەرەكەی (٦٥٨٦) كم٢ یە. قەزای خانەقین هەرچەندە هەندێ كاری تیاكراوە لەمەركەزی قەزا، بەڵام بەهۆی مانەوەی ئاسەواری داگیركاری لەدەوروبەری قەزاكە هەر مەترسی لەسەرە. ئەگەر سەركردایەتی سیاسی كوردستان بیەوێ پەسەندی پرۆژەیەكی لەم جۆرە بكات، دەتوانێ خانەقین بكات بەپارێزگاو هەریەك لەقەزاكانی بەدرەو مەندەلیو كەلارو كفری بخرێتەسەرو لەچوارچێوەی هەرێمی كوردستاندا وەك كانتۆنێكی ئیداری ئۆتۆنۆم بۆ فەیلییەكان بیناسێنێ، دەبێتە هۆی ئەوەی كەئەو ژمارە كوردە فەیلییە بەرچاوەی بەغدا كەئێستا بەشێكیان خەریكە لەبۆتەی مەزهەبی شیعەدا دەتوێنەوە، دەگەڕێنەوە ناو خاكی كوردستانو دەبنە هاوپشتیو بەهێزكردنی پایەی سیاسی كورد لەعێراقدا، كەئەوەیان ئەركی ئەحزابی كوردیو سەركردایەتییەكەیەتی كار بۆ زیندوكردنەوەی ڕۆحی نەتەوەیی ئەندامانی نەتەوەكەی بكات. ئاماژەدان بەكانتۆنی ئیداری ئۆتۆنۆم، لەیەك كاتدا هاندانی فەیلییەكانە بۆ گەڕانەوەیان بۆ ناو خاكی كوردستانو دروستكردنی هەستی خۆبەخاوەن زانینیان بۆ ئەو ناوچەیە، شەرعییەت دانە بەدروستكردنی یەكە ئیدارییەكە، تاپۆكردنەوەی ئەو

بەشە خاکە گرنگو ستراتیژییەی کوردستانەو دەرخستنی سیمایەکی مەدەنیانەی زیاتری کوردە وەك گەلێکی جیاواز لەناوچەکە لەژیانی خۆ بەرێوەبردنداو رەخساندنی زەمینەی لەبارتر بۆ بەشداریپێکردنی تەواوی پێکهاتەکانی کوردستانە لەکایە سیاسییەکەی کوردستاندا.. خۆ رزگارکردنە لەو کۆتە دەستوورییەی ئێستای عێراق کە بەپەیرەوکردن و جێبەجێکردنی نابینەوە خاوەنی بەشێکی گرنگی ئەم ناوچەیە.

**- دروستکردنی پارێزگایەك لەقەزا کوردستانییەکانی موسڵو کردنی بەیەکەیەکی ئیداری ئۆتۆنۆم بۆ مەسیحیو شەبەكو ئێزدییەکانی کوردستان:**

یەکێکی تر لەو گرفتانەی دێنە پێشمانو رێوشوێنێکی گونجاوی چارەسەرکردنیمان دانەناوە، ئەو قەزا کوردستانییانەی سەر بەپارێزگای موسڵن، کێشەکەیان لەگەڵ یەکە ئیدارییەکانی کەرکوکدا جیاوازە، ئەمان وەك قەزاکانی کەرکوك بەبریاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرشو سەرۆکایەتی کۆماری عێراق لەپارێزگایەکی کوردستانەوە نەخراونەتە سەر موسڵ، تا باوەرمان وابێ دواجار ئەو بریارانە هەڵدەوەشێنەوەو هەیکەلە ئیدارییەکە وەك خۆی لێ دەکرێتەوە، لەوێ حاڵەتەکە پێچەوانەی کەرکوکەو دهۆك بەبریارێك لەموسڵ جیاکراوەتەوەو کراوەتە پارێزگا، هەندێك لەو قەزایانە هەروا بەئاسانی ناخرێنە سەر پارێزگای دهۆك. وەك:—

قەزای مەخمور، لەگەڵ ناحییەکانی قەراج، کەندیناوا، گوێر، بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) رووبەرەکەی (٢٧٥٩) کم[٢] یە.

قەزای حەمدانییە، لەگەڵ ناحییەکانی بەرتیلە، خدر ئەلیاس، ئاسکی کەڵەك، بەپێی ئاماری (١٩٨٧) رووبەرەکەی (١١٨٨) کم[٢] یە.

قەزای تەلکێف، لەگەڵ ناحییەکانی ئەلقوشو وان، سەر بەپارێزگای موسڵە، بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) رووبەرەکەی (١٢٥٧) کم[٢] یە.

قەزای شەنگار، لەگەڵ ناحییەکانی ئەلشیمالو قەیرەوان، بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) رووبەرەکەی (٣١٨٨) کم[٢] یە.

قەزای تەلعەفەر، لەگەڵ ناحییەکانی زەممارو ئاڤگەنێو رەبیعە، سەر بەپارێزگای موسڵە، بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) رووبەرەکەی(٤٢٩٧) کم[٢] یە.

قەزای شێخان، لەگەڵ ناحییەکانی مزوریو مرێبا، سەر بەپارێزگای موسڵە، بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٨٧) رووبەرەکەی (١٣٣٣)کم٢یە.

ناکرێ کوردیش هەروا بەئاسانی دەستبەرداریان بێت، لەو نێوانەدا باشترین رێگەچارە ئەوەیە سەرکردایەتی سیاسی کوردستان بریار لەسەر بەپارێزگا کردنی یەکێ لەو شەش قەزایە بدات کەدەکەوێتە ناوەندەوەو دەتوانرێ لەرووی ئیدارییەوە قەزاکانی تری پێوە ببەسترێتو بکرێت بە کانتۆنێکی ئیداری ئۆتۆنۆم بۆ مەسیحیو شەبەك ویەزیدییەکانی کوردستان، هەمان ئەو دەستکەوتانەی بەنموونە لەبەپارێزگاکردنی خانەقیندا هێنامەوە، بۆ ئەم ناوچەیەو فرە رەنگییەکەی بۆ کورد گرنگترە.. وەنابێ کورد لەوە بترسێ لەناو چوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا مافی پێکهاتەکەی تری کوردستان بداتو بەدڵنیاییەوە بەو شێوەیە ئینتیمایان بۆ کوردستان زیاد دەکاتو پێکەوە دەبینە پایەیەکی گرنگی تێپەراندنی ئەم قۆناغەو لەچارەنووسێکی گەشتر نزیکمان دەکاتەوەو دۆستو پشتیوانی زیاتر بۆ گەلی کوردستانو حکومەتەکەی پەیدا دەبێو کێشەو گیروگرفت بۆ داهاتومان کەمدەبێتەوە.

*** کەرکوك کرۆکی مەسەلەکە:**

گەرچی بەدرێژایی مێژویی داگیرکردنی پارچەکانی کوردستان، کەمترین دەرفەت خوڵقاوە بۆ ئەوەی کورد کیانێکی ئازاد دروستبکاتو لەزۆرترین قۆناغەکانی مێژوودا کورد ژێردەستەو خاکەکەیشی داگیرکراوبووە، بەڵام بەهۆی ئەو بارودۆخانەی لەم بەشەی کوردستانی بەعێراقەوە لکێندراودا بزوتنەوەیەکی درێژخایەنتری رزگاری خوازی هەبووەو لە سەرەتای لکاندنی کوردستان بەعێراقەوە کەرکوك تایبەتمەندییەکی ململانێی وەرگرتووە، بۆیە بووەتە رەمزی کێشەکانی کورد لە عێراقو لەپارچەکانی تری کوردستانیشدا سەرباری ئەوەی کەهێشتا خۆیان رزگار نەکراون، بەڵام کەرکوك وەك ناسنامەی رزگاریی نیشتمانی دەبینن، کوردێك لەکرماشانو دیاربەکرو قامیشلۆ بەر لە رزگاری شارەکەی خۆی ئومێدی رزگاری کەرکوك دەخوازێ. ئەمە وایکردووە کەسەرکردایەتی سیاسی کوردی سڵ لەوەبکاتەوە بەجۆرێك بیر لەچارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك بکاتەوە کەدواجار شەقامی کوردی پێی هەزم نەکرێت.. هەربۆیە دەبینی زۆرجار خیتابی کورد لەبەرانبەر کێشەی کەرکوك خیتابێکی ناواقیعیو توندرەوانەی نەتەوەیی بووەو هەندێجار چووەتە چوارچێوەی موزایەدەو کەسبکردنی شەقامی کوردییەوە.. بەڵام لەسەر ئەرزی واقیعی کەرکوك کێشەکانی ئاڵۆزتر کردووەو دواجار باجی هەمووی پێکەوە دەدەینەوە.. ئەگینا سەرکردایەتی سیاسی کوردستان ئەوە دەزانێ کە ئەو رێوشوێنە یاسایی ودەستوورییەی دانراون بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ناوچەکانی ململانێ لەناویاندا کەرکوکیش، بەهیچ شێوەیەك زامنی وەرگرتنەوەی کەرکوك ناکات، بەڵام راگەیاندنی ئەو راستییە قورسەو کەس جورئەتی ئەوەناکات داوای رێگەچارەی تر بکات.. بەتایبەتیش ئێستا لەکاتێکدا نەیارانی کوردو ئەوانەی دژی گەرانەوەی کەرکوکن بۆ سەر هەرێمی کوردستان بەئەندازەیەك هەوڵیان خستووەتەکار کەئەنجامەکەی روونە بەخواستی ئەوان دەشکێتەوەو کورد لە پر تووشی شۆك دەبێت.. خەتاکەیشی جارێکیتر کورد خۆیەتی، بەشێکی لە ئەستۆی سەرکردایەتی سیاسی کورددایە کە لە هەڵبژاردنی رێگەی چارەسەرکردندا هەڵەیانکرد، خراپ کارکردنی کورد لەناوچەکانی ململانێو ناواقیعیو مامەڵەکردن لەگەڵ پێکهاتەکانی تردا بەشێکی تری خەتاکەیە کەدواجار پێکەوە هۆکاری ئاڵۆزتربونی کێشەکەو دابرانی یەکجارەکی ئەو

ناوچانەن لە کوردستان.. بۆیە باوەڕی من وایە دەبێ کورد باجی گەورەی هەڵەکانی بداتەوە، باجدانەوەش پێویستە هەر ژیرانە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، بەتەنازولاتی ئیداری. یان دەستووری. یاخود دانوستان، واتا دەستبەرداربوونی شتێك لەپێناوی وەرگرتنەوەی شتێکی تردا.. کەهیوادارم ئەم بۆچوونە بەتەنازول‌و مساوەمەکردن ئەژمار نەکرێت، من دەخوازم کورد دەوڵەتی هەبێ وکەرکوك پایتەختی دەوڵەتەکەی بێت‌و خاوەنی چەکی ئەتۆم بێت بۆئەوەی کەس ئاڵای وڵاتەکەمان نەهێنێتە خوارەوە.. بەڵام ئومێدو هیواخواستن چەند ڕەوایش بن، کارناکاتە سەر ئەوەی لەئەرزی واقیعدا هەیە.

ئێستا کەرکوك لەبەردەم چارەنووسێکی ترسناکدایە، زۆر ترسناکتر لەو دۆخانەی داگیرکرابوو لە ڕابردوودا، چونکە ئەمجارەیان بەخواستی کورد خۆی‌و بەڕەزامەندی سەرکردایەتییەکەی ڕێوشوێنی یاسایی‌و دەستووری دیاریکرا بۆ دیاریکردنی چارەنووس‌و ناسنامەکەی.. کەهەڵەی کوشندە ئەو ڕۆژەبوو کورد دەستبەرداری ئەو هەموو واقیعە مێژوویی‌و بارە دیمۆگرافیایەی کەرکوك بوو سپاردی بەوەی دانیشتووانەکەی سەر خاکەکەی کەرکوك بڕیار لەسەر ناسنامەی خاکەکەی بدەن، کە هیچ داگیرکەرێك لەڕابردودا خۆی لەڕاستی کوردستانییەتی کەرکوك نەدزیوەتەوە، بەڵام بەهێز داگیری کردووە. ئێستا کەرکوك خەریکە بەهێزی دەستووری‌و یاسایی بەیەکجاری لەکوردستان دابڕێ، سیاسەتی ناواقیعی‌و خیتابی ئیستفزازییانەی کوردو ئیدارەیەکی خۆسەپێنی کوردی بێ شەریککردنەوە یان بەشداری پێکردنی هاوشارییەکانی کورد لەکەرکوك، بارودۆخی کەرکوکی گەیاندۆتە لێواری تەقینەوەیەك کەخاوەن ماڵ لەهەمووکەس زیاتر زیانی پێدەگات.. کاتێ ناسنامەو چارەنووسی کێشەیەکی وەك کەرکوك کە ڕەمزی هەموو برینەکانی کوردە، دەسپێردرێت بەدڵی دانیشتووانەکەیەوە لەکاتێکدا بەشێکی زۆری دانیشتووانەکەی ئەو هێزە بەکاربراوەی ئامرازی داگیرکردنەکەی بوون، بێ ئەوەی کار بۆ کڕینی دڵیان بکرێت لەکاتێکدا کڕینی دڵی ئەوان کڕینەوەی کەرکوك بوو، بێگومان دەمانگەیەنێتە ڕێگاچارەیەکی ترسناك.. کەبڕیاربێ هەموو ئەوانەی لەکەرکوك دەژین وەك من مافی دیاریکردنی چارەنووسیان هەبێ کەواتا پێویستە ئێمە بەدوای خاڵی هاوبەشدا بگەڕێین بۆ ئەو چارەنووسەی من دەمەوێ، کەچی سیاسەتی کورد سیاسەتێکی ئیستفزازی هاوشارییەکانێتی لەکەرکوك.. کەتۆ بڕیاری پێش وەختت ئەوەبێ لەدیاریکردنی چارەنووسی شارەکەدا شەریکتبن ئەی بۆ پلانێکت بۆ شەراکەتێکی ڕاستەقینەی پێکەوە بەڕێوەبردنی پرۆسەکە نییە.. کاتێ بەپێی هەموو پێوەرە مەنتقییەکان‌و ئیستحقاقاتی هەڵبژاردنیش واقیع دەیکاتە شەریکت، کەچی دەرگا بەڕووی هاو شارییەکانتدا دادەخەیت، بۆ نمونە کوردو تورکمان وەك دوو هاوشاری کەمێژویەکی درێژە پێکەوە لەکەرکوك دەژین.. پێکەوە دەبینە قوربانی سیاسەتەکانی بەعس، پێکەوە ئازارو ئەشکەنجە ئەدرێین‌و دەربەدەر دەبین، چارەنووسیشمان پێکەوەیە، ئەم هەموو خاڵە هاوبەشە نەبووەتە هۆکاری پێکەوە کارکردنی ئەمرۆمان، ئەی لێرەوە ئایندەی پێکەوەژیان ببینە لەکەرکوك.. پرۆسەیەکی سیاسی وادەکات دەرفەتێك دروستبێت بۆ دروستکردنەوەی پردی پەیوەندی کەئەویش هەڵبژاردن‌و پێکهێنانی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك‌و ئیدارەی شاری کەرکوکە، ئێمە دێین دەرگاکان پێوە ئەدەین ڕێگانادەین لەگەڵمان بەشداربن لەئیدارەی شارەکە، پرسیار ئەوەیە ئەی بۆ کوێ بچن.. چەپڵەمان بۆ دەکوتن یان پیلانمان لێدەگێڕن..؟ چاوی خۆمان لەڕاستی ئەو هەقیقەتانە نابینا دەکەین کەبۆخۆمانی بەڕەوا دەبینین‌و نامانەوێ بەرانبەرەکانمان پێی شادبن، بۆ نمونە ئێمە لەعێراقدا کەمتر لەچارەکی دەنگەکانی عێراقمان بەدەست هێنا، ئیئتیلافی شیعە زۆرینەی دەنگەکانی برد، بەڵام لەبەرئەوەی نیەتی ئیئتیلاف دروستکردنی حکومەتێکی هاوبەش بوو لە عێراقدا پۆستی سەرۆك کۆماری دا بەکوردو سەرۆکی پەرلەمان بۆ سونەو سەرۆك وەزیرانی بۆ خۆی هەڵگرت.. ئێمە لەکەرکوك کەمێك لەسەروی نیوەمان بەدەست هێنا، پێمان وابووە سێ پۆست گرنگن (پارێزگارو سەرۆکی ئەنجومەن‌و قایمقام) بەڵام هەرسێکی بۆ خۆمان دادەنێین.. ئێمە لەدیالە ٧ کورسی لەکۆی ٤١ کورسی ئەنجومەنی پارێزگامان بردەوە، سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگاو جێگری پارێزگاریان دا بەکورد، لەتکریت لەو ڕێژەیەش کەمترمان بەدەست هێنا، یاریدەدەری پارێزگاریان داوە بەکورد.. کەچی لەکەرکوك لیستێکی تورکمانەکان ٩ کورسیان لە ٤١ کورسی بەدەست هێنا، ئێمە قایمقامێکیان نادەینێ.. ئەمە تادەگاتە کۆی سیاسەتکردنمان لەئیدارەدانی ململانێکانی کەرکوکدا پەیرەوکردنی هەمان عەقلیەت بووە. بۆیە ئێستا دەبینی بەجۆرێك ڕەنگی داوەتەوە کەهەڵوێستی دۆستە هاوپەیمانەکانیشمان بگۆڕێت، سیاسەتی کورد سیاسەتی ئیحراجکردنی دۆستەکانی بووەو لەئێستاوە سەرەتاکانی ئەو ئیحراجکردنانە دەرکەوتوون‌و لەبەرانبەریشدا بەرەی جیاجیا دروستبوون کەڕێگری لەبەدیهاتنی خواستەکانی کورد دەکەن، ڕۆڵی وڵاتانی ئیقلیم تورکیاو وڵاتانی عەرەبی‌و هاوپەیمانان خەریکە هەموویان یەکانگیر دەبن.. بۆیە وایدەبینم کورد پێویستی بەگۆڕینی دەسکەلاکانی بێت، بەتایبەتیش ئەوەی پەیوەندی بەچارەسەرکردنی کێشەکانی کەرکوکەوە هەیە. مادەی ١٤٠ بەدیار کەرکوکەوە مردار دەبێتەوەو ناتوانێ کەرکوك بگەڕێنێتەوە بۆ سەر هەرێمی کوردستان.. پێویستە ڕێوشوێنی گونجاوتر بدۆزینەوە. لەپەیوەندیمان لەگەڵ عەرەبی سونەی ناوچەکەو تورکمانەکانی کەرکوك‌و بەدەستنیشانکراوی دەبێ پەیوەنیمان لەگەڵ بەرەی تورکمانی چاك بکەین، کەئەمڕۆ خیتابی جەبهەی تورکمانی تەعبیر لە ڕای زۆرینەی تورکمان دەکات.

*** کەرکوك وەك ئیدارەیەکی ئۆتۆنۆم لەچوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا:**

پەندێکی کوردی هەیە دەڵێ (ئەوەی لەماڵ درەنگ دەرچوو، دەبێ لەڕێگە ڕابکات) بۆ کوردیش تازە بڕیار

لەسەر هەڵبژاردنی هەر ڕێگایەك بدات، هەر لەماڵ درەنگ دەرچووە.. بۆیە دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین کەمەرج نییە ئێمە چۆنمان دەوێ کەرکوك بەو شێوەیە چارەسەربێت. پێویستە لێرەشدا بەدوای خاڵی هاوبەشدا بگەڕێین، بەرەچاوکردنی تایبەتمەندی کەرکوك‌و موراعاتکردنی هاوشارییەکانمان لە کەرکوك، ڕەنگە باشترین ڕێگا ئەوەبێت لەچوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا کەرکوك کانتۆنێکی ئیداری ئۆتۆنۆم بێت‌و نیمچە سەربەخۆیی خۆی هەبێ‌و بەمیکانیزمی دەستووریی پەیوەندییەکانی لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستاندا ڕێکبخرێت، هەیکەلەی ئیداری کەرکوك بەشێوەیەك دەستکاری بکرێت کە دوزخورماتوو چەمچەماڵ بخرێنەوە سەر ئیدارەی کەرکوك‌و بەشێوەیەکی ئاسایی کار بۆ ئاساییکردنەوەی بکرێت لەگەڕانەوەی مافی موڵکدارێتی بۆ خاوەنەکانیان، ئیدارەیەکی هاوبەش لەنێوان پێکهاتەکەی کەرکوکدا دروستبکرێت کەهیچ لایەك ترسی لەوانیتر نەبێ‌و بەزەماناتی دەستووری متمانە لەنێوان پێکهاتەکەی کەرکوکدا دروستبکرێتەوە کە لە ئێستادا ئەو متمانەیە بوونی نییە.. دەکرێت بۆ هەڵبژاردنی ئەم ڕێگەچارەیە سەرکردایەتی کورد گفتوگۆ لەگەڵ پێکهاتەکەی کەرکوك تورکمانەکان‌و عەرەبی سونەی ناوچەکەدا بکات، کەبەمەش ئەو ترس‌و گومانانە دەرەوێتەوە کەئێستا لەسەر کورد دروست بووە.. پێویستە کورد پێش هەر وتووێژێك لەگەڵ پێکهاتەکانی تر چاو بە ڕەشنوسی دەستووری هەرێمی کوردستاندا بخشێنێتەوەو ئەو میکانیزم‌و ئالیەتانە دیاری بکات بۆ مامەڵەی لەگەڵ هەیکەلە ئیدارە نوێکان‌و مافی ئاین‌و مەزهەب‌و نەتەوەکانی تر لەدەستووردا دەستەبەر بکات‌و پاشان بەو هێزە دەستوورییەوە بچێتە گفتووگۆوە.

*** کەرکوك وەك هەرێمێك بۆ ماوەیەکی دیاریکراو:**

ترسناکترین شت ئەوەیە لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان شەرعیەت بە هەرێمێکی تر بدرێت، ئەویش بەپلەی یەکەم لەبەر گرفتی سنووری جوگرافیای کوردستان.. بەڵام لەحاڵەتێکدا ئەگەر کورد لەهەڵبژاردنی ڕێگاکانی تردا شکستی خواردو بەهیچ کام لەو ڕێگایانە نەیتوانی کەرکوك بگەڕێنێتەوە سەر هەرێمی کوردستان، ئەوە لە جیاتی درێژکردنەوەی ماوەی جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠، بیر لە تەرحێکی تر بکاتەوە باشترە. چونکە درێژکردنەوەی ماوەی جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠) واتا مانەوەی هەمان ئەو کێشانەی ئێستا هەیە، بەتایبەتیش کەهەر بەغدا بڕیاردەربێت کەتێگەیشتنی ئێمە وایە بەغدا پێی بکرێت نەك کەرکوك ناخاتەوە سەر هەرێمی کوردستان، بەڵکو داگیری دەکاتەوە. بۆیە هێشتنەوەو درێژکردنەوەی مادەی (١٤٠)و هەر مادەیەکی تر لەژێر دەستی بەغدا بێت دواجار هەمان ئەو گرفتانەی لەڕابردودا هەبوون دووبارە دەبنەوە، بۆیە هەڵبژاردنی ڕێگای دووەم کەکەرکوك بۆ ماوەی ساڵێك یان دووساڵ هەرێمێك بێت بەمەرجی ئەوەی دوای ئەو دوو ساڵە ڕاپرسی تیابکرێت بۆ یەککگرتنی لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا، بۆ کورد ئاسانتر دەتوانێ کاری تیابکات، چونکە جیاکردنەوەی کەرکوك لەبەغدا بەهەر نرخێك بێت بۆ کورد گرنگە کە لە قۆناغی یەکەمدا دەستی بەغدا لەکەرکوك بکێشێتەوە.

*** شەراکەتی ڕاستەقینە:**

یەکێ لە هەڵە گەورەکانی سەرکردایەتی کورد لەدەستنیشانکردنی ئەو ڕێوشوێنە یاسایی‌و دەستوورییانەی بۆ چارەی کێشەکان دیاریکرابوو، لە ڕوویی یاساییەوە غیابی حکومەتی کوردستان بوو لەناوچەکانی ململانێ، کە ڕوون بوو ململانێ لەنێوان کوردو بەغدابوو، بەغدا حزوری بەرچاوی هەبوو لەو ناوچانە بەڵام حکومەتی هەرێمی کوردستان بونێکی شەرعیەت پێدراوی یاسایی نەبوو، دەکرێت لەهەڵبژاردنی هەر ڕێوشوێنێکی تردا ئەوە لەبەرچاوبگیرێت ئەگەر کەرکوك بەهەر جۆرێك‌و چەند دواخرا، لەبەرانبەردا حکومەتی هەرێم‌و بەغدا پێکەوە شەریکبن لەئیدارەدانی‌و میکانیزمێك بدۆزرێتەوە بۆ ڕێکخستنی ئەو ئالیەتی پێکەوەییەی نێوان حکومەتی هەرێم‌و بەغدا، چونکە سپاردنەوەی کەرکوك بەبەغدا بەواتا هێشتنەوەی کێشەکان وەك خۆی.

*** ڕێگای چوون بەرەو نەتەوە یەککگرتووەکان:**

گەرچی ئەوەی لەدەستووردا هاتووە دوای ئەوەی هیچ کام لەڕێگە دەستووریی‌و یاساییەکان چارەسەری کێشەکانی نەکرد، ئەوە دەبێ نەتەوە یەککگرتووەکان کەسێکی ناسراوی بێلایەن چارەسەری کێشەکە بگرێتە ئەستۆ.. بەڵام تائێستا نمونەیەکی بەرچاو نییە کە نەتەوە یەککگرتووەکان کێشەیەکی لەو جۆرەی چارەسەر کردبێ، بۆیە ترسێك لای کورد هەیە کە تەسلیم بوون بەنەتەوە یەککگرتووەکان بەمانایی درێژکردنەوەی کێشەکان‌و مانەوەی بۆ نەوەکانی داهاتوو.. کەئەوەش لەخواستی کوردەوە دوورە. بەڵام هەر کام لەو ڕێگایانە بوونە ئەمری واقیع باشترە لەوەی لەدەستبچێت، ئەگەر ڕێگەی چوون بەرەو نەتەوە یەککگرتووەکان دوایەمین ڕێگاش بێت کورد دەتوانێ پرۆژەی خۆی بەرێتە ئەو ناوەندە جیهانییەو لەوێ داوای زەماناتی دەولی بکات‌و سەرجەم کێشەی کورد بەرێتە نەتەوە یەککگرتووەکان، نەك تەنها کێشەی چەند شارو شارۆچکەیەك.

کۆی ئەم خوێندنەوانە دەمانگەیەنێتە باوەڕێکی چەسپاو کەپێویستە سەرکردایەتی سیاسی کوردستان زیاتر لەپرۆژەیەکی هەبێ، بۆ چونە هەر مفاوەزاتێکەوەو بۆ هەر مەشروعێك مەشروعێکیتری بەدیلی ئامادەی پێبێت.

*** دواجار بەڕێگای سەربازی:**

ڕەنگە لەئێستادا بیرکردنەوە لەپەلاماری سەربازی بڕیاری ڕاگەیاندنی مەرگی بەدەستهاتووەکانی ئەمڕۆمان بێت، بۆیە واپێویستە سەرکردایەتی سیاسی کوردستان زۆرترین ڕێگە بداتە پێش چاو لەپێناوی ئەوەی ئەو ناوچانەی لەدەست نەچێت، تەنانەت بەهەڵبژاردنی ڕێگە ترسناکەکانیشەوە. کەلەهەل‌و مەرجێکی وەك ئێستای عێراق‌و ناوچەکە هەڵبژاردنی ڕێگای سەربازی ئەو ڕێگە هەڵدێرەیە، بەڵام لە

دەستچوونی ناوچەکان کارەساتی گەورەترەو کورد زیانی زیاتری تیا دەکات، بۆیە دەبێ لەدووا ڕێگادا کەهیوادارم کورد کاری پێی نەبێ، هەر پەنابەرێتە بەر ئەم ڕێگایە.. ئەوەش لەئێستاوە خۆئامادەکردن‌و دراسەی وردی دەوێ، بۆ چۆنێتی ڕزگارکردنی ئەو ناوچانەی کوردستان.

## * کوردو تورکمان، پرۆژەیەك بۆ ڕاستکردنەوەی واقعێکی خوڵقێنراو:

محەمەد شاکەلی

* سەرەتا:

چەند سەدەیەکە کوردو تورکمان لە کەرکوكو دەوروبەری ژیان پێکەوە بەسەر دەبەن، (ئایین، خزمایەتی، بازرگانیو کارو بەرژەوەندی هاوبەش) پێکەوەی گرێداونو ژیانێکی ئاسودەو تەباییان بەدرێژایی مێژوو پێکەوە بەسەر بردووە.

لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوو پاش سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلی کوردو سیاسەتی شۆفینزمانەی کەمالیەکانی تورکیا دژ بە کوردو دروست بوونی بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی سەر بە تورکیای کەمالی لەناو تورکمانەکانی عێراقداو ڕۆڵی کۆمەڵەی (ئیتحادو تەرەقی)[1] کە لقێکی لە کەرکوکدا هەبوو ئەوانە هەموو دەورێکی سەلبیان هەبوو لە پەیدابوونی جۆرێك لە ساردی لە پەیوەندییە گەرمو گورەکانی نێوان هەردوولادا، بەڵام ئەو ساردیە هەرگیز نەگەیشتوەتە گرفتو ناکۆکی قووڵ لەنێوانیاندا، دۆستایەتیو بەرژەوەندی هاوبەشیان وەك خۆی مایەوە تا شۆڕشی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨)[2].

یەکێك لە دەرئەنجامەکانی ئەو شۆڕشە دەرگا کردنەوە بوو لەسەر کورد بۆ ئەوەی بە بەشێك لە مافە ڕەواکانی خۆی شاد بێت کە لە دارشتنی دەستووری کاتی سیستەمی کۆماری عێراقدا بەرچاو دەکەون بە تایبەتی لە مادەی سێیەمی ئەو دەستوورەدا.

پاش شۆڕشی چواردەی تەمموز کورد لە رووی کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو سیاسەتەوە هەنگاوی بەرچاوی دەنا بۆ پێشەوە، ئەوەش بەلای دوژمنەکانیەوە جێگای ڕەزامەندی نەبووەو چەند لە توانایاندا بوبێت هەوڵیان دەدا ڕێگای پێشکەوتن لە گەلی کورد بگرنو درێژە بە چەوسانەوەی بدەن.

ئەو دوژمنانە ژیرانە تورکمانیان بەکار دەهێنا بۆ ئەو مەبەستە لەناو عێراقو لە دەرەوە بە بەرنامە کار دەکرا بۆ ئەوەی متمانەو برایەتیو دۆستایەتی نێوان تورکمانو کوردا نەمێنێو دوژمنایەتیو گومانو ترسو بێ باوەری لە جێگایان بێتە کایەوە.

ئەوان تورکمانیان بەوە دەترساند کە ئەگەر کورد دەسەڵاتی هەبێت لە ناویان دەبات، قەلاچۆیان دەکاتو ماڵو موڵکیان داگیر دەکاتو... هتد.

مەبەستم لە نووسینی ئەم بابەتە دەربارەی پەیوەندی کوردو تورکمان لە کەرکوك ڕوون کردنەوەو شیکردنەوەی پەیوەندی دێرینی نێوان ئەو دوو لایەنە گرنگو بنەرەتییە کە بەشی هەرە زۆری پێکهاتەی دانیشتووانی کەرکوك پێکدێننو هەوڵ دانە بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی ڕاستو واقیعی بۆ کێشەی کەرکوكو هاوکاریو لەیەك گەیشتنی کوردو تورکمان وەکو پێویستو لەسەر بناغەی دان بە ماف یەکتر دانانو یەکتر خوێندنەوە.

کورد پێی وایە کەرکوك بەشێکە لە کوردستانو داوا دەکات کەرکوك بخرێتەوە سەر هەرێمی کوردستانو لەپێناو جێ بەجێ بوونی ئەو داخوازیە ئامادەیە درێژە بە خەباتی هەمە لایەنەو چەندین ساڵەی خۆی بدات.

تورکمانیش داوای مسۆگەر کردنی ئەو مافانەی دەکات کە بە ڕەوای دەزانێ لە کەرکوکدا، هەردوولا داخوازی ڕەوای خۆیان هەیەو بەراستی دەزانن.

بێگومان ڕێگای گفتوگۆی هێمنو جیدی دەتوانێ هەردوولا بگەیەنێتە قەناعەتو ئەنجامی باش. لەو مەسەلەیەشدا دەبێ کورد دەستپێشخەری بکاتو لە مەوقیعی تواناو دەسەڵاتەوە ئەم دەستپێشخەریە بکات، چونکە قازانجی لە وەدایە تورکمانیش لە گفتوگۆو هاوکاریو تێگەیشتن لە هەلو مەرجی پاش نەمانی سەدام زەرەمەند نابێت، بەخۆدا چوونەوە بۆ هەردوولا پێویستە. ئێمەی کورد پاش ئەو هەموو ڕەنجو قوربانیو ماندوو بوونە، ئێستا لە هەلو مەرجێکی نوێو جیاوازداین. ناکرێت خەباتی چەندین ساڵەمان بەهۆی هەڵسوکەوتی خەڵکێکی نا مەسئول بە فیرۆ بڕواتو ناوبانگی کوردو تێکۆشانی بزرێت بۆ چەند دەستکەوتێکی مادیو دەسەڵاتی پوچەڵو بە ئەنجامدانی کارو کردەوەی نامرۆڤانە بەرامبەر ماڵو سامانو ئارامی برا تورکمانەکان، ناکرێت ئەوانە هەق بە خۆیان بدەن بە ناوی کوردەوە ناوی پیرۆزی پێشمەرگەو شۆڕشو تایبەتمەندی مرۆڤ دۆستانەی کورد بەو کردەوە ناشیرینانە لە کەدار بکەن.

ئەگەر ئێمەی کورد بەو پەڕی سنگ فراوانییەوە بیسەلمێنین کە دەسەڵاتدارێکی ستەمکار نینو ئامادەین بە مافە ڕەواکانی برا تورکمانەکان قایل بین، ئەوا خاڵێکی دیکەی پرشنگدار لە مێژوودا بۆ خۆمان تۆمار دەکەین. حەقە برا تورکمانەکانیش لە پەندو تاقی کردنەوەکانی ڕابردوو سوود وەرگرن، ئەوەندە باوەریان بە بەڵێنو پشتگیری دەرەوە نەبێتو هاوپەیمانیەتی لەگەڵ لایەنو گرووپێك کە جێگای باوەرنین نەبەستن، نەیارو دوژمنانی برا کوردەکانیان بەدۆستی خۆیان نەزانن، چونکە ئەگەر وا بکەن ئەوان لەم هاوکێشەدا زەرەمەندی یەکەم دەبن، دۆستو هاوپەیمانو هاوبەرژەوەندی نزیكو مێژوویی تورکمان کوردە.

پاییزی ساڵی (١٩٥٧) پاش تەواو کردنی خوێندنی ناوەندی لە شاری کفریو لەبەر ئەوەی ئەوکات لە قەزاو ناحییەکاندا ئامادەیی نەبوو چوومە کەرکوكو لەوکاتەوە پەیوەندییەکی گەرمو زیندووم هەبووەو هەیە لەگەڵ کێشەی درێژ خایەنو ئاڵۆزی کەرکوکدا.

لە ئامادەیی (موسەڵلا) وەرگیرام، ئامادەییەکە لە خانوویەکی گەورەی دوو نهۆمی کۆنی گەرەکی (موسەڵلا)ی تورکمان نشیندا بوو، بە کۆڵانی پێچاو پێچو باریکی نێو گەرەکەکەدا تێپەر دەبووین کە لە قایەو گەچ دروست کرابوون تا دەگەیشتینە قوتابخاکەمان. پاشان بۆ ساڵی دووەمی خوێندن گواستمانەوە بینایەکی نوێ کە لەسەر ڕۆخی ڕۆژهەڵاتی چەمی خاسە دروست کراو هەمان ناوی

پێشووی لێ نرابوو، پۆلەکەمان (٢٢) قوتابی تێدابوو لەوانە یەك مەسیحی بە ناوی (ئارسین)و پێنج عەرەبو حەوت تورکمانو هەشت کورد. یەکێکی ترمان لەگەڵ بوو بە ناوی (نادر) تا کۆتایی خوێندنمان لەو ئامادەییە بۆمان ساغ نەبووەوە کورد بوو یان تورکمان! قوتابیە عەرەبەکان چواریان خەڵکی ناوچەی (حەویجە) بوونو یەکێکیان دانیشتووی ناو شار بوو.

پەیوەندی نێوانمان ئاسایی بوو بۆ خوێندنیش لەناو پۆلدا زمانی عەرەبی بەکار دەهێنرا، لە دەرەوە زۆربەی قوتابیەکان کە ناوەندیەکیشی لەگەڵ بوو بەهەمان ناو تورکمانو کورد بوونو ئەو دوو زمانە بەکار دەهات. قوتابیە کوردو تورکمانەکان زمانی یەکتریان دەزانیو لایان ئاسایی بوو بەکامە زمان قسە بکرێت، بەڵام عەرەبەکان تەنها عەرەبیان دەزانیو کوردیو تورکمانی فێر نەدەبوون یان بە پێویستیان نەدەزانی فێر بین.

(فازل گەللۆ)، کە پاشان بە (فازڵ ئەلعەزاوی) وەکو شاعیرو ئەدیبێکی ناودار ناسرا، یەکێك لەو قوتابیە عەرەبانەی دانیشتووی ناو شاری کەرکوك بوو، ئەو بە تورکمانیەکی باش دەدواو کەمێك زمانی کوردیشی دەزانی، لەگەڵ ئێمە زۆر تێکەڵاو دەبوو هەر لە سەرەتاوە بەهرەیەکی باشی هەبوو لە ئەدەبیاتو شیعرو زمانی عەرەبیدا.

بەڕێوەبەری ئامادەییەکە خوالێخۆشبوو (مامۆستا عوسمان قۆجە قەساب) بوو، بە ناوەکەیدا لە سەرەتاوە وامان دانابوو تورکمانە پاشان دەرکەوت لە بنەماڵە ناسراوەکانی شاری هەولێرەو پیاوێکی بە ئەزمونو میهرەبانو خواناس بوو، بەبێ جیاوازی مامەڵەی لەگەڵ هەمووماندەکردو بەگەرمی لە کێشەو گرفتی قوتابیانی دەپرسیەوە هاوکاری دەکردن.

مامۆستا (جمال نەبەز) لە ساڵی یەکەمی خوێندنمان وانەی لە بەشی ناوەندی قوتابخانەکەدا دەوتەوە، پاشان گواسترایەوە بۆ شوێنێکی دیکە، لەو ماوەیەدا پەیوەندییەکی گەرمو دۆستانەی لەگەڵ قوتابیە کوردەکانی ئامادەییدا هەبوو و ناوبەناو باسی کوردایەتیو سیاسەتیشی بۆ دەکردین، (سوبحی بیلال دەدەی کاکەیی) وانەی وەرزشی دەوتەوە، باقی مامۆستاکان تورکمانو عەرەبی عێراقیو میسری بوون.

ساڵی خوێندنی (١٩٥٧ – ١٩٥٨)مان بە ئارامی بەسەر برد، لە ناوەڕاست ئەو ساڵەداو لە کاتی وتنەوەی وانەی جوگرافیا بابەتێکی تێدابوو بە ناوی (یەکێتی سۆڤیەت – رووسیا) مامۆستای جوگرافیا خوالێخۆشبوو (سامی شاکر ئەلعێراقی) بووبەبێ ئەوەی پێویست بکات هێرشی کردە سەر ئەو وڵاتە گوایە دوژمنی ئیسلامەو جێگای کەسێکی وەکو (بارزانی) (یاخی بوو) لە حکومەتی عێراقی کردۆتەوە کە نەدەبوو رووسیا پەنای بدات، ئەوکاتانە ناوهێنانی خوالێخۆشبوو (بارزانی) قەدەغە بوو خەڵك خۆی لادەدا لە شوێنی گشتی باس لەو مەسەلەیە بکات.

ئێمە هەڵوێستی مامۆستاکەمان زۆر لا ناخۆشو قورس بوو، هاوەڵێکمان بە ناوی (خالد هدایەت) کە خەڵکی گەرەکی ئیمام قاسم بوو، هەڵساو بە توندی بەرپەچی مامۆستای دایەوەو گوتی بارزانی یاخی نییەو وەکو مامۆستایەك دەبێ هەستی قوتابیەکانت رابگریت، سەرئەنجام بوو بەدەمەقاڵەو بە تورکمانی جنێوێکی زۆریان بەیەکترداو بەڕێوەبەری قوتابخانە ئاگادار کرایەوە (خالید)یش لە پۆل دەرکراو ئێمەش قوتابیە کوردەکان هەموومان بەدوای ئەودا چووینە دەرەوە، دوو قوتابی تورکمانیش لەگەڵمان هاتنە دەرەوە..

مامۆستا عوسمان قۆجەی بەڕێوەبەر باش دەیزانی ئەگەر ئەو مەسەلەیە بچێتە دەرەوەو بگاتە دەزگا ئەمنییەکانی ئەو سەردەمە بە زیانی (خالید هیدایەت) تەواو دەبێت، لە پاش ئەوە هەوڵێکی زۆریدا هەردوولا ئاشت بکاتەوەو پاشان لە ژووری بەڕێوەبەری ئامادەییەکە (سامی شاکر)و (خالد هیدایەت) دەستیان لەمل یەکترکردو کێشەکە کۆتایی هات.. دەبێ ئەوەش بڵێم لە کاتی ئاشت بوونەوەی هەردوولا مامۆستا (جمال نەبەز) بێ باکانە هەرەشەی لە سامی شاکر کرد کە ئەگەر پەشیمان بێتەوەو لە دەرەوە باسی ئەو مەوزوعە بکات خۆی بەرپرس دەبێت چی بەسەر دێت. دیارە (سامی شاکر) لەو هەرەشە ترساو دوای ئەوە هەرگیز باسی هیچی نەدەکرد، ناوبەناو لەناو پۆلدا دەیگوت: (ئاخر برام خالید باش لەمن نەگەیشتووە من قسەی خراپم بە کورد نەگوتووە).

بە پێچەوانەوە ساڵی خوێندنی (١٩٥٨ – ١٩٥٩) پڕ بوو لە کێشەو ئاڵۆزیو ململانێ کە گرنگترینیان رووداوی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٩) بوو. لێرەدا چونکە باسەکەم دەربارەی پەیوەندی نێوان کوردو تورکمانەو ئەو رووداوە تا ئێستاشی لە گەڵدابێت کاریگەرییەکی نێگەتیڤی لەسەر ئەو پەیوەندییانە بە جێهێشتووە، بە چەند دێرێك ئاماژەی بۆ دەکەم.

پاش تێپەر بوونی نزیکەی نیو سەدە بەسەر رووداوی تەموزی ساڵی (١٩٥٩)دا ئاسان نییە بە چەند دێرو لاپەرەیەك، رایەکی یەکلاکەرەوە بۆ خوێنەری ئەم سەردەمە لە کەسێکەوە کە نزیك بووە لە رووداوەکەوە بنووسرێت. بەڵگەو شاهیدی زیندوش ماونو لایەنە سیاسییە ناکۆکەکانیش زۆریان لەسەر نووسیوە، هیوادارم لە ئاییندەدا لێکۆڵینەوەیەکی بەپێزو بەکەڵك و پشت بەستو بە بەڵگەو نووسراو بە ئەقڵێکی کراوەو هێمنیەوە بکەوێتەوە بەرچاوی خوێنەرانو راستی رووداوەکانی روون بکاتەوەو هەوڵەکەش لە خزمەت گێڕانەوەی متمانەو باوەڕی نێوان تورکمانو کوردا بێت.

دوژمنانی کورد ئەو رووداوەیان لە قەوارەی راستەقینەی خۆی گەورەتر کردووە بۆ شێواندنی ناوبانگی بزووتنەوەی رزگاری خوازی گەلی کوردستان. بیرو بۆچوونو سیاسەتی ئەو دەمەی بزوتنەوەی کوردایەتی هیچ بەرنامەو نەخشەو پلانێکی نەبووە بۆ جێبەجێ کردنی رووداوێکی لەو شێوەیە، ئەوەی روویدا بە پێچەوانەوە ئەوەندە لە ناکاوو بە پەلە هاتەپێشەوە، نەتوانرا بەپەلە رایەکی یەکگرتوو و هەڵسەنگاندنێکی بابەتییانەی لەکاتی خۆیداو لەلایەن کورد خۆیەوە بۆ بکرێت.

جگە لەوەی ئەنجامی رووداوەکە بە ووردیو بەئەنقەست لەلایەن دوژمنەکانی کورد بەکار هات بۆ تێکدانی پەیوەندی

مێژوویی نێوان تورکمان و کورد هۆکاری دەرەکی و جموجۆڵی گومان لێکراوی هەندێ ناوەندی دەسەڵاتی بەغداش دەوریان هەبوو لە پێکهێنانی ئەو بارە ئاڵۆزەی لە رووداوەکە کەوتەوە.

کورد وەکو نەتەوە بەشداری ئەو رووداوەی نەکردووە لە شەڕێکی دژ بە تورکماندا، لە وانەیە وەکو تاك کەسانێك بە شداربوون. بە پێچەوانەشەوە زۆربەی کوردەکانی کەرکوك دەورێکی ئیجابیان بینیوە لە گێڕانەوەی ئارامی و پاراستنی سەرو ماڵی دراوسێکانیان. لەگەڵ ئەو هەموو بێ سەرو بەری و کەس بە کەس نەبوونەی لە هەل و مەرجی وەکو ئەو کاتانە دێتە پێشەوە.

رووداوەکە ئەنجامی کۆمەڵێك ململانێ و بەرژەوەندییە دژ بەیەکەکانی ناو عێراق و دەرەوە بووە و کەرکوك و ئایندەی کەرکوك و دانیشتووانی بە کورد و تورکمانەوە بوون بە قوربانی ئەو بەرژەوەندیانە و دوژمنان تا رادەیەکی زۆر لەو هەوڵەدا سەرکەوتوو بوون.

کەرکوکی ئەو کاتە (ناوەڕاستی سەدەی بیستەم) بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی دیاری تێدا بەدی دەکراو خۆی دەسەپاند و گەشەی دەکرد، یەکێتی قوتابیانی کوردستان لەناو شاردا رێکخراوێکی چالاکی بواری رۆشنبیری و سیاسی و کۆمەڵایەتی بوو، ئەو رێکخراوە سێبەری دەرەوەی جموجۆڵ و چالاکی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، (عەلی عەسکەری) و (جیهان سدیق) و (جەبار کاکل) و (کاکەمەم بۆتانی) و (حەمە نوری تۆفیق) و (لەتیفی شێخ حامید) و (تەها تۆفیق) و (نورەددین عەبدولرحمان) و (خالید دلێر) و (نەجمەددین گلی) و کەسانی کە خەڵکی دیارو ناسراوو چالاکی ناو ئەو رێکخراوە بوون[٣].

ئێمە و هاوتەمەنەکانی ئێمە لە ئامادەیی و ناوەندییەکانی شاردا لە ریزی دوای ئەوانەوە بووین و ژمارەمان زۆر بوو، ئەتوانم بڵێم زۆربەی قوتابیە کوردەکانی ئامادەیی (موسەڵلا) و ئامادەیی (کەرکوك)، ناوەندییەکانی خۆرهەڵات و خۆر ئاوا راستەوخۆو ناراستەوخۆ بەشدارو بەئاگا بوون لە چالاکی ئەو رێکخراوەی باسی دەکەم.

بەرپرسانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان، بە ئاشکرا بە ناوی حیزب کاریان نەدەکرد، بەڵکو زیاتر بایەخیان دەدا بە بڵاوکردنەوەی بیری نەتەوەیی و رۆشنبیری کوردی، ئەوان قوتابیانی کوردیان هان دەدا بابەت و نووسراوو چاپ کراو بە زمانی کوردی بخوێننەوە و زمان و نووسینی کوردیان باشتر بکەن، ئەو کاتە چاپکراوی کوردی زۆر کەم دەست دەکەوت و چاپ دەکرا، کتێبخانەیەك یان راستترە بڵێم دوکانێکی بچووکی بەرامبەر بارەگای پارێزگاو لەشکری دووی ئەو کاتەی سوپای عێراقی هەبوو کە خاوەنەکەی (عومەر بێکەس) بوو، ئەو رۆژنامەی (ژین) و (هەتاو) و (شەفەق) و (هیوا) و هەرچی کە لە بازاڕی چاپی کوردیدا پەیدا دەبوو ئەیهێناو لە پێش دوکانەکەی دادەنا و ئێمەش سەردانمان دەکرد و دەمانکڕی و دەست بە دەست دەخوێندرایەوە.

هەر کتێبێکیش دەربارەی کورد بە زمانی عەرەبی دەگەیشتە کتێبخانەکانی کەرکوك ئاگاداریان دەکردین بۆ خوێندنەوەی وەکو مەم و زین بەزمانی عەرەبی بە ناوی (رۆمیۆ جولیت - الأدب الکوردي) لە نووسنی (محەمەد سەعید رەمەزان) کە نووسەرێکی کوردی سوریا بوو، کتێبەکەی قونسولی رووسی (مینۆرسکی) لە ئازەربایجان دەربارەی مێژووی کوردی بە زمانی عەرەبی... و تاد..

دیارە ماوەی پەیوەندیمان لەگەڵ یەکێتی قوتابیانی کوردستان پێش شۆڕشی (١٤)ی تەممووزی ساڵی (١٩٥٨) بە تاقی کردنەوەیەك دانراو تێدا سەرکەوتوو بووین بۆ وەرگرتنمان لە ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان. لەبەر ئەوە بوو پاش شۆڕش بە چەند رۆژێك زۆربەمان بە ئەندامی ئەو حیزبە وەرگیراین و دەستمان کرد بە جێبەجێ کردنی ئەرکی رێکخراوەیی کە بۆمان دیاری دەکرا.

جگە لە ئامادەیی (موسەڵلا) کە لە رۆژهەڵاتی شاردابوو لە رۆژئاواش (ئامادەیی کەرکوك) هەبوو، لەوێش ژمارەیەکی باش قوتابی کورد دەیانخوێند و لەگەڵ ئەواندا پەیوەندی و هاتووچۆمان هەبوو. بەڕێوەبەری ئامادەییەکە خوالێخۆشبوو (فاتح مستەفا) بە پێچەوانەی بەڕێوەبەری ئامادەییەکەی ئێمە، پیاوێکی توندو کەللە رەق بوو، ئەو پێی خۆش نەبوو قوتابیە کوردەکان سەردانی یەکتر بکەن و هەوڵی دەدا رێگامان لێ بگرێت لە ئەنجامی ئەو توندو تیژیەی لەنێوان مامۆستای ناوبراو بەرپرسەکانی قوتابیە کوردەکانی ئەو ئامادەییە کە لە (عەلی عەسکەر) سەرپەرشتی دەکردن و لەراستیدا ئەو لێپرسراوی چالاکییەکانی هەموو یەکێتی قوتابیان بوو لە کەرکوك. شەڕو ئاژاوەیەك روویداو کاك (عەلی) ماوەیەك قوتابخانەی بە جێهێشت، بەڵام پاشان کەسە ناودارەکان لە کوردو تورکمانەکانی شاری کەرکوك ناوبژیان لەنێوان بەڕێوەبەرو کاك (عەلی) کردو رەوشەکە ئاسایی بووەوەو چالاکی قوتابیان درێژەی پێدرا.

یەکێك لە چالاکییە دیارەکانی رێکخراوی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە کەرکوك پێش شۆڕشی (١٤) ی تەممووزی ساڵی (١٩٥٨)، خۆ ئامادە کردن بۆ سازدانی ئاهەنگێکی گەورە بوو بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە لە شاری کەرکوکدا. سەرەتا لەگەڵ کاربەدەستانی (لیواکە) هەوڵ دراو رەزامەندیان وەرگیرا، ئامادەکارییەکی جەماوەری باش ئەنجامدرا بۆ ئەو ئاهەنگە لە نزیك تەکیەی تاڵەبانی، بەڵام بەفەرمانی دەزگا ئەمنییەکانی شارو لەسەر بڕیاری حکومەتی ناوەندی رێگادانەکە پوچەڵ کرایەوەو قوتابیانی کوردستان و هەڵسوڕێنەرانی ئاهەنگەکە هەندێکیان دەستگیر کران و هەندێکیشیان هەڵاتن، پاشان دەستگیرکراوەکان ئازاد کران، بەڵام بۆ رۆژی دووەم یان سێیەم لە دەرەوەی شار ئاهەنگێکی خنجیلانە بەنهێنی جێ بە جێ کرا[٤].

ئەوکاتە بارەگای لەشکری دووی سوپای عێراقی لە کەرکوکدا بوو، تا بەرپابوونی شۆڕشی (١٤)ی تەممووز زۆربەی ئەفسەرو سەربازەکانی ئەو سوپایە کوردو تورکمان بوون، بەڵام پاش تەممووزی ساڵی (١٩٥٨) و پاش ئەوەی گەورە ئەفسەرێك بەناوی (ناظم تەبەقچەلی) کرا بەفەرماندەی ئەو سوپایە هەوڵێکی زۆری دەدا بۆ کەم کردنەوەی ژمارەی ئەفسەرە کوردەکان[٥]، ئەو هەوڵەش دەزگاکانی پۆلیسی شاریشی دەگرتەوە تا گەیشتە ئەو رادەیەی پاش کودەتای

(٨)ی شوباتی ساڵی (١٩٦٣) بەدەگمەن ئەفسەری سوپاو پۆلیسی کورد لە کەرکوك بەدی دەکراو زۆرینەیان عەرەبو پاشان تورکمان بوون[٦]، ئەفسەرە کوردەکان بەشێکیان گواسترانەوە بەغداو باشووری عێراق بەشێکیشیان خانەنشین کران[٧].

وەرگرتنی قوتابی کوردی دەرچووی ئامادەیی لە کۆلیژی ئەفسەریو پۆلیس قەدەغە کرابوو، قوتابی کورد بەهۆی جۆراوجۆر وەرنەدەگیرا تەنانەت ئەگەر هەموو مەرجەکانیشی تێدا بوایە، بۆ نموونە لە کۆتایی ساڵی خوێندنی (١٩٥٨ - ١٩٥٩) ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیانی کوردی دەرچووی هەردوو ئامادەیی (موسەڵلا)و (کەرکوك) و قوتابی کوردو عەرەبو تورکمان داوایان پێشکەش کرد بۆ وەرگرتن لە کۆلیژی ئەفسەری یان پۆلیس، لە ئەنجامدا هەموو عەرەبەکان وەرگیران، بەڵام تاقە قوتابیەکی کورد رێگای پێنەدرا ببێتە ئەفسەری پۆلیس یان سوپا.

ئەو سیاسەتە بەشێك بوو لە بەرنامەیەك بۆ زۆر کردنو بەهێز کردنی تواناو دەسەڵاتی عەرەب لە شاردا بەرامبەر بە لاواز کردنی پێگەو تواناو دەسەڵاتی کورد لە کەرکوکدا، بەڵام بەرنامەکە شاراوەو نهێنی بووەو بەشێوەی ناراستەوخۆ جێ بەجێ دەکرا، ئامرازو کەرەستەی جێ بەجێ کردنی بەرنامەکەش دانیشتووانی عەرەبی حەویجە بوونو پاشان خەڵکی شارەکانی دیکەی عێراقو کاربەدەستانی میری بە رەگەز عەرەب کە لە کەرکوکدا کاری حکومەتیان دەکرد.

ناوچەی (حەویجە)[٨] کە پێشتر بە ناحیەی (مەلحە) ناسرابوو، سەرچاوەی سەرەکی هێزو دەسەڵاتی عەرەبی لیوای کەرکوکی ئەو سەردەمە بوو، پاشانیش دەورێکی ئێجگار گرنگی گێڕا لە سیاسەتەکانی حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی ناوەندی عێراقدا بۆ تەعریب کردنی کەرکوك.

عەرەبەکانی نیشتەجێی حەویجە بە چەند شێوەیەكو لە کاتی جیا جیاداو بەسوود وەرگرتن لە هەلو مەرجی سیاسیو گۆڕانکارییەکانو خەم ساردی کوردی کەرکوك بەرادەی یەکەمو پاشان تورکمان[٩]، لە حەویجەوە بە هێمنیو لە سەرخۆ خزانە ناو شاری کەرکوكو شوێنو پێگەی ئابووریو کۆمەڵایەتیو دەسەڵاتیان بۆ خۆیان پەیدا کرد، کوردو تورکمانی شار ئەو کاتانە دەرکیان بەوە نەدەکرد[١٠] کە هاتنی ئەو (میوانانە) لە ئاییندەدا سەرئێشەو کێشەیان بۆ دەنێتەوە، رەنگە دەسەڵاتی ناوەندی عێراقی ئەوکات سیاسەتێکی داڕێژراوو نەخشەو پلانی پێشوەختەی نەبووبێت بۆ هێنانی ئەوانەو بەرنامەیەکی تۆکمە لە ئارادا نەبووبێت، بەڵام کاربەدەستە عەرەبەکانی کەرکوك کە لە شارەکانی موسڵو بەغداو جێگای دیکەوە هێنرابوون زۆریان پێ باش بوو هاونەتەوەکانیان زۆر بنو دەسەڵاتیان فراوان بێت لە کەرکوکدا، لەبەر ئەوە بوو ئەوان ئاسانکارییان بۆ دەکردن لە دامەزراندو نیشتەجێ بوونو هانیان دەدان بۆ مانەوەو پلەو پایەیان دەدانێ، ئەو فەرمانبەرو کرێکارانەی لە شارەکانی ناوەراستو رۆژئاوای عێراق بەرادەی یەکەم پاشان لە خوارووی عێراقەوە دەهاتنە کەرکوك لەلایەن حوکمڕانو دەسەڵاتدارە هاوزمانو هاونەتەوەکانییانەوە بە گەرمی پێشوازییان لێ دەکراو یارمەتی دەدران.

ناوچەی حەویجە لەماوەی چەند ساڵێکدا لەسەر زەوییەکی وشكو بێ ئاوو بێ دارو سەوزاییەوە گۆڕا بۆ ناوچەیەکی پانو بەرینی پڕ لە ئاوو کشتوکاڵو بەرهەمی جۆربە جۆر، زۆریش لە کۆچەرە عەرەبەکان زەویان بەسەردا دابەش کراو نیشتەجێ بوونو ژیانو گوزەرانیان بەتەواوی بەرەو باشتر گۆڕا.

سەرۆك وەزیرانی عێراقی ئەو دەمە (یاسین هاشمی)[١١] هەموو توانای مادیو مرۆیی بەکار هێنا بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەکانی ئاوەدانکردنەوەو گەشە پێدانی ناوچە بە عەرەب کراوەکانو تا رادەیەکی زۆر لەو پرۆژانەدا سەرکەوتوو بوو[١٢].

لە ساڵانی (١٩٣٠ - ١٩٤٥) ناوچەی حەویجە لە بیابانێکی بێ کەڵكو چۆڵەوە گۆڕا بۆ ناوچەیەکی ئاوەدانو پڕ بوو لە دانیشتووانی عەرەب.

کوردو تورکمانی کەرکوك کە بەشی زۆری زەویو زاری حەویجە بەپێی یاسا موڵکی ئەوان بوو، وەکو پێویست بایەخیان بەو گۆڕانکارییانە نەدا یان هەستیان بە مەترسی ئەو گۆڕانکارییە دیموگرافییە نەدەکرد، لەسەر ئایندەی خۆیانو داوای قەرەبووی لەدەستدانی زەوییەکانیان نەکرد وەکو مافێکی یاساییو بە زۆری باوەریان هێنا بەوەی حکومەتی عێراق بەو کارە ئاژاوەو کێشەی نێوان عەرەبەکان چارەسەر دەکاتو بەپیری داوای میرییەوە چوون بۆ بەشداری کردن لە ئاشت کردنەوەی عەرەبە بەشەڕ هاتووەکاندا.

دەتوانین بڵێین بە خۆرایی ئەو زەویو زارانەیان لەسەر داواو بەڵێنو تکاو پاڵپەستۆی دەسەڵاتی ئەودەمەی عێراق بە عەرەبەکان بەخشی، بەشێکیان وا تێگەیشتبوون بەو کارە هاوکاریو خزمەتی برایەتیو تەباییو هاونیشتمانیو دراوسێیەتی دەکەن.

ئەو عەرەبە کۆچەرانەی دەهاتنە باکووری چیاکانی حەمرین وەکو نەریتی خەڵکی کۆچەر زۆر جار لەسەر لەوەرگاو ئاو، کێشەو گرفتی قوڵ دەکەوتە ناویانو شەڕو ئاژاوە پەیدا دەبووو لە ئەنجامدا خەڵکیان لە یەکتر دەکوشتو تاڵان دەکردو زیانی زۆریان بەر دەکەوت، بەتایبەتی لەنێوان تیرە عەرەبەکانی (عوبێد)و (جبور)و (شەمەر)و (ئەلعزەدا).

پاش دامەزراندنی یەکەم حکومەتی عێراقی لەسەرەتای بیستەکانی سەدەی رابردوودا، دەسەڵاتی نوێی عێراق پاش ئەوەی ئاژاوەی خێڵە عەرەبەکانی لێ بوو بەگرفتێکی ئاڵۆزو گەورە بیری دەکردەوە بۆ دۆزینەوەی رێگا چارەیەك بۆ کێشەی کۆچەرە عەرەبەکانی باکوورو باشووری حەمرینو خۆ رزگار کردن لەسەر ئێشەیەکی گەورەو درێژ خایەن.

ئەمەش هەوڵێکی باش بوو بۆ حکومەتی عێراقی تا بەکاری بهێنێ، لەلایەك لە کێشەی ئائارامی عەرەبی کۆچەر رزگاری بێتو لە لایەکی ترەوە ناوچەیەکی گەورەو فراوانی نزیکی کەرکوك بە عەرەب ئاوەدان بکاتەوەو پاشان بەیەکجاری لەوێدا نیشتەجێیان بکات.

بەناوی چارەسەر کردنی کێشەی نێوان تیرە عەرەبەکانو دوورخستنەوەیان لە یەکتر ژمارەیەکی زۆر عەرەبی کۆچەر

لە تیرە جیاجیاکان هێنرانە ئەو ناوچەیە کە یەکەم وەجبەی ئەو عەرەبانە لە سنووری (٢٠) هەزار کەسدا دەبوو[١٣]، ئەو پرۆژە بە ئاشکراو بەئاگاداریو بەبێ بەرهەڵستکاری کوردو تورکمانی کەرکوك جێ بە جێ کرا.

پاش ماوەیەك پرۆژەیەکی گەورەو ستراتیژی بە هێنانی ئاو لە زێی بچووك بۆ سەر زەویو دێهاتە جێ بە جێ کراو حکومەتی ئەودەمەی عێراق پارەو پولێکی زۆری سەرف کرد بۆ گەیاندنی ئاو بۆ دەشتاییە ووشكو بێ ئاوەکانی ناوچەکە کە عەرەبی بۆ دەهێنرا. پێش هاتنی عەرەب[١٤] بۆ ئەو ناوچەیەی باس کرا (باکووری حەمرین) لە کۆنەوە تیرەو تایفە جیا جیاکانی کورد لە وەرزی بەهاردا دەگەیشتنە دامێنی چیاکانی حەمرین، بەڵام نەپەڕیونەتە بەری باشووری چیاکەو هیچ کاتێك لە بستە زەوییەکی دەرەوەی کوردستان سوودیان وەرنەگرتووە، ئەوان لە ناحیەی (مەلحە) کە دواتر بە قەزای حەویجە ناسراو لە دەورووبەریدا نیشتەجێ دەبوونو بە کشتوکاڵو مەردارییەوە خەریك دەبوون، بەڵام ئەو کاتە ژمارەی دانیشتووان بە گشتی کەمو بووو ئەرزو ئاو لە باکووری کەرکوكو ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتیدا زۆر بوو، لەبەر کەم ئاویو گەرمیو ناڵەباری هەوای حەویجەو دەورووبەری، کورد زۆر بایەخیان بە مانەوە نەدەدا لەو ناوچە ووشكو بێ دارو سەوزیو ئاوەدا، تەنها ماوەی زستانو بەهار دەمانەوە پاشان دەیانگواستەوە بۆ ناوچەکانی لەیلانو قەرە حەسەنو شوانو دووبز لەوێ نیشتەجێ دەبوون.

لەبەر ئەو هۆیانەی باسکران پانتاییەکی فراوان زەوی لە باشووری ڕۆژئاوای کەرکوکدا زۆربەی کاتەکانی ساڵ بە چۆڵی دەمایەوە، تەنها چەند ماڵە مەردارێکی کورد بەدیار مەڕو ماڵاتەوە دەمانەوە، ناوبەناویش تیرە بەدوەکانی عەرەب بە ئاگاداریو ڕازیبوونی خاوەن ئەو زەویو لەوەرگانەی کە کورد بوون دەهاتنە ناوچەکە بۆ لەوەڕخۆری، پاشان دەگەڕانەوە بۆ ئەودیوی حەمرین. هێشتا عەرەب لەودەمەدا لەناو شاردا بوونێکی دیارو بەرچەستەیان بەدی نەدەکرا جگە لەوانەی لە دامەزراوەکانی دەوڵەتدا سەربازو پۆلیسو ئەفسەرو کارمەندانی دامو دەزگاکانی حکومەت بوون کە زۆربەیان لە شارەکانی موسڵو بەغداو باشووری عێراقەوە هاتبوون، هاووڵاتی ئاسایی عەرەبی خاوەن کارو پیشەو زەویو بەرژەوەندی ئابووری سەربەخۆ لە شاردا کەم بوون بەپەنجەی دەست ئەژمێردران. بەڵام شێوەی ئەو پێکهاتەی باس کرا پێش شۆڕشی (١٤)ی تەمموزی ساڵی (١٩٥٨) بە ماوەیەكو بەتایبەتی پاش کودەتای (١٤)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٩٦٣) گۆڕانی گەورەی بەسەردا هاتو دەسەڵاتی نوێی ناوەندی عێراق بە بەرنامەو ڕاشکاوانەو بەبێ شەرم کاری جیدی دەست پێ کرد بۆ بە عەرەب کردنی کەرکوكو دەورووبەری. بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەکانی خۆی دەسەڵاتی یەکەمی بەعسی پاش کودەتای ساڵی (١٩٦٣) زەبرو زەنگو دێهات وێران کردنو دەرکردنی کارمەندی کوردی کۆمپانیای نەوتو قەدەغە کردنی خوێندنی کوردیو دەیان شێوەی توندو تیژی بەکار هێنا بۆ سەپاندنی سیاسەتە شۆڤینزمەکانی خۆی. لێکۆڵینەوەیەکی ووردو بێ لایەنو بابەتیانە دەربارەی مێژووی سەد ساڵی ڕابردووی (لیوای کەرکوك) دەیسەلمێنێ عەرەب تەنها بۆ لەوەڕخۆریو بەخێو کردنی مەڕو ماڵاتو حوشترەکانیانو بەشێوەی کاتی لەوەرزەکانی ووشکە ساڵو کەم بارانیدا گەیشتوونە باکووری زنجیرە چیاکانی حەمرین کە سنوورێکی سروشتیو مێژوویی نێوان کوردستانو عێراق پێك دێنێت.

پاش کۆتایی هاتنی شەڕی جیهانی دووەم بەماوەیەکی کەم شاری کەرکوك بوژانەوەیەکی ئابووریو ئاوەدان کردنەوەی گەورەو فراوانی بە خۆیەوە بینی، ئەوەش پێویستی بە کرێکارو تەکنیککارو سەرمایەدارو سەنعەتکاری شارەزای بواری بیناسازیو بازرگانیو جێ بە جێ کردنی پرۆژەی گەورە بوو، دەرهێنانو پاڵاوتنی نەوتو ناردنی بۆ دەرەوە یەکێك لە هۆکارە گرنگەکانی ئەو بوژانەوەیە بوو[١٥].

لە هەموو لایەکەوە خەڵك بۆ کارو کەسابەت ڕوویان لە شاری کەرکوك دەکرد لە بەغداو موسڵو باشووری عێراقو حەویجەو دەورووبەرەوە بە تاكو کۆمەڵ دەگەیشتنو دەستیان بەکار دەکرد. دانیشتووانی ڕەسەنی شارەکە لە کوردو تورکمان بەبێ گرفتو حساسییەت مەسەلەی هاتنی ئەو خەڵکەیان تەماشا دەکرد، دەسەڵاتی ناوەندی عێراقیش بەراستەخۆو ناراستەوخۆ لەگەڵ کۆچی عەرەبدا بوو بۆ کەرکوكو ئاسانکاری لێرەو لەوێ بۆ دەکردن. کەرکوکی پێش شۆڕشی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨) یەکێك لە شارە گەورەو گرنگەکانی عێراق بوو، بۆ کەسێکی بێگانە کە هاتبێتە شارەکەو لە نزیکەوە چاودێری باری کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسی شاری کردبێت دەگەیشتە ئەنجامێکی ڕوون کە شارەکە زۆرینەیەکی کوردی تێدایەو پاشان تورکمان بەشێکی گەورەی پێکهاتەی کەرکوك بوون، دوای ئەوان عەرەبو مەسیحی لە شاردا هەبوون، پرۆسەی نیشتەجێ کردنی هەزاران ماڵە عەرەبی کۆچەر لە تیرەو تایفە جیاوازەکان لە باشووری ڕۆژئاوای کەرکوكو بە تایبەتی پاش ئەوەی بۆ دەسەڵاتی عێراق ڕوون بۆوە کە کەرکوك لەسەر دەریایەکی نەوتدایە، بروسکەیەك بوو هەروا لە خۆڕا نەهاتبوو، بەڵکو هەنگاوی یەکەمی تێکدانی باری دیمۆگرافی کەرکوكو دەوروبەی بوو[١٦]، ئەو پرۆسەیەش لە ژێر ناوی چارەسەرکردنی کێشەو ململانێی نێوان هۆزو تایفە عەرەبەکاندا بوو، بەڵام لە ڕاستیدا سەرەتای نەخشەی بە عەرەب کردنی کەرکوك لێرەوە دەستی پێکرد[١٧].

بەتێپەڕ بوونی کاتو هاتنی ژمارەیەك زیاتری خێزانی عەرەب بۆ ناوچەکەو جێ بە جێ کردنی پرۆژەکانی گەیاندنی ئاوی زێی بچووكو هاوکاری دامو دەزگاکانی میری بۆ دانیشتووانی تازە گەیشتوو بۆ ئەوەی لەسەر خۆیان بوەستنو باری ئابووریو ژیانیان باشتر بکرێت، بوونی ناوچەی حەویجە وەکو ناوچەیەکی عەرەب نشین بوو بەواقعێك، ئەو واقیعەش ڕۆڵێکی یەکجار گەورەو سەرەکی بینی لەسەر هاوکێشەی کەرکوکدا، دەرەئەنجامەکانی ئاوەدان کردنەوەی حەویجە بە عەرەب، بەزیانی دانیشتووانی ڕەسەنی کەرکوك تەواو بووەو تا ئەمرۆش ئەو پرۆسە بە یەکێك لە هۆیە گرنگە بنەڕەتییەکانی تێکچوونی شیرازەی

پێکهاتەی دانیشتووانی کەرکوك و دەوروبەری ئەژمێردرێت.

کورد لەناو شاری کەرکوك و هەموو سنووری پارێزگاکەدا پێگەی تایبەتی و دیاری ئابووری و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و سیاسی هەبووە، بنەماڵە ناسراوەکانی شار، (خانەقاو تاڵەبانی و زەنگەنەو کاکەیی و ساڵەیی و بەرزنجەو شوان) لە مێژەوە لەناو شاردا ناسراون و رۆڵی کاریگەرییان هەبووە لە گەشە کردنی پەیوەندییە جۆر بە جۆرەکانی نێوان خەڵکدا، تەکیەو خانەقاو دیوەخانەکانیان هەمیشە گەرم و گوڕو بە خزمەت بوون و هاتووچۆیان کراوە، لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانی تاوەکو دروست بوونی حکومەتی شا فەیسەڵی یەکەم و پاشان دەسەڵاتی کۆماری حیسابی تایبەتیان بۆ کراوە. تورکمانی کەرکوکیش بە هەمان شێوە بنەماڵەی ناسراو و کەسایەتی کۆمەڵایەتی دیاریان هەبووەو دەورێکی ئیجابیان گێڕاوە لە ژیانی خەڵکی شارداو پرس و رایان پێ کراوە لەلایەن دەسەڵاتدارە جیاوازەکانەوە[18].

لەنێوان خۆیاندا کوردو تورکمان هاتووچۆو پەیوەندی دۆستانەو خزمایەتیان هەبووە، جگە لە بەرژەوەندی هاوبەشی ئابووری لە ناو شاری کەرکوك و دەوروبەری و لەگەڵ شارەکانی دیکەی کوردستاندا.

عەرەب لە کەرکوك تا سەرەتای پەنجاکانی سەدەی رابوردوو پێگەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی دیاریان نەبووە، بێ گومان لە ناوچەی حەویجەو ئەولاتر بەلای رۆژئاواو باشووردا و لەناو تیرەو هۆزەکانی خۆیاندا دەورو تەئسیری خۆیان هەبووەو بۆ خۆیان داب و نەریت و تایبەتمەندیان لە وێدا پاراستووە[19].

سەرانی تیرەو هۆزە عەرەبەکان ناوبەناو سەردانی شاریان دەکردو لەلایەن دەسەڵاتدارانی حکومەتەوە پێشوازیان لێ دەکراو هاوکاری باشیش دەکران، بەڵام لەبەر ئەوەی ماڵ و دیوەخان و جەماوەریان لەناو شاردا نەبوو، کاریگەرییان لەسەر باری کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری کەرکوکدا بەدی نەدەکرا بەرادەیەك ئەگەر پێویستی ببوایە بە مانەوەیان لە شاردا، لە هۆتێلەکان دەمانەوە یان میوانی دیوەخانی دۆستەکانیان دەبوون لە کوردو تورکمانی شاری کەرکوك[20].

لە سنووری جوگرافی لیوای کەرکوکی جاران و پارێزگای کەرکوکی پاش (١٤)ی تەمموزی ساڵی (١٩٥٨)، زۆربەی ئەندامانی پەرلەمانی سەردەمی دەسەڵاتی پاشایەتی عێراق بەرادەی یەکەم کوردو پاشان تورکمان بوون[21]، لە یەك دوو دەورەی پەرلەمانی عێراقدا تەنها عەرەبێك وەکو نوێنەری ناوچەی حەویجە گەیشتوەتە ئەندامێتی پەرلەمان[22].

زۆربەی زانا ئایینییەکان[23] و مەلا ناسراوەکانی کەرکوك بەرادەی یەکەم کوردو پاشان تورکمان بوون، لە مزگەوت و تەکیەو خانەقاکانی کەرکوکدا، حەلقەی دەرس وتنەوە هەمیشە گەرم بوو، ژمارەیەکی زۆر فەقێ لە شوێنی جیا جیاوە دەهاتنە شاری کەرکوك بۆ فێر بوونی زانستی ئایینی و زمانەوانی و ئەدەبیات و سوودیان لە عیلم و توانای مەلا ناسراوەکانی کەرکوك وەردەگرت. تەکیەی تاڵەبانی و خانەقای سەید ئەحمەدی خانەقا بە دوو قوتابخانەی گرنگ و پایە بەرزی فێر بوونی زانستی ئایینی و فیقهی و ئەدەبیەکان ناسراو بوون، لە باشووری کوردستاندا دەیان مامۆستای پایە بەرزو خاوەن زانست لەو دوو ناوەندە دەرچوون و ئەوانیش بۆ خۆیان لە شوێنی جیا دەرسیان ووتۆتەوەو قوتابی و مەلای شارەزایان پێگەیاندووە[24].

هەر لەو سەردەمانەدا باس لە هەبوونی ناوەندێکی ئایینی و رۆشنبیری و مزگەوتێك ناکرێت لە کەرکوکدا[25]، زانایەکی عەرەب وانەی تێدا بە قوتابیان ووتبێتەوە یان هەلقەیەکی وانە ووتنەوە لەلایەن مەلایەکی عەرەبەوە بەڕێوە برابێت و ناوی مامۆستایەکی ناسراوی ئایینی عەرەب لە مێژووی کەرکوکدا باسی لێ ناکرێت. ئەمە لە کاتێکدا شارەکانی موسڵ و بەغداو رومادی و سامەڕا پڕ بوون لە زانای بەتوانای عەرەب و حەلقەی ووتنەوەی زانستی ئایینی زۆر گەرم و بەبەرهەم بووە لەو شارانەدا، ئەوەش دەیسەلمێنێ هەبوونی رۆشنبیری تایبەتی عەرەبی و کاریگەری عەرەب لەو بوارەدا لە کەرکوکدا نەبووە یان زۆر لاواز بووە، بەهۆی ئەو راستییەوە کە لە کەرکوکدا ژمارەیەکی زۆر کەم عەرەبی نیشتەجێ هەبوون[26]. لێرەدا مەبەست ئەوە نییە لە توانای عیلمی و رۆشنبیری عەرەب کەم بکەینەوە، بەڵکو روون کردنەوەی حەقیقەتێکە ئەوەش عەرەب بە زۆر دەیانەوێ خۆیان و خەڵك چەواشە بکەن کە گوایە لە کۆنەوە توانا و دەسەڵات و کاریگەری رۆشنبیری و کۆمەڵایەتیان لە شاری کەرکوك و دەوروبەری دا هەبووە، کە ئەوەش پێچەوانەی راستییەکانەو ئەوان تەنها بەو هێزەی لەبەردەستیاندا بووەو وەکو دەسەڵات و شەرعیەتی حکومەت بەهەموو شێوەیەك هەوڵیان داوە خۆیان بسەپێنن و خاوەن ماڵی راستەقینە کە کورد و تورکمان بوون بسڕنەوە[27].

پێش شۆڕشی (١٤)ی تەمموزی ساڵی (١٩٥٨)و لەدوای پێکهێنانی یەکەم حکومەتی عێراقی ساڵی (١٩٢١) و لە ئەنجامی سەرکەوتنی بیری نەتەوەیی تورك و وەرگرتنی دەسەڵات لە دەوڵەتی عوسمانی لەلایەن (مستەفا کەمال)ەوە، لەناو تورکمانی کەرکوك و شوێنە تورکمان نیشینەکانی کە بیرو بۆچوونی کەمالیزمی توندو رەگەز پەرستانە پەیدا بوو. ئەوان سەرەتا وەکو تاك و گرووپی بچووك بانگەشەیان بۆ گەڕانەوەی ویلایەتی موسڵ بە کەرکوکیشەوە بۆ دەوڵەتی تورکیا دەکردو کەرکوکیان بە شارێکی تورکمان نشین دادەنا.

بیرو باوەڕی کەمالیزم و خۆ بەستنەوەی تورکمان بەسیاسەتی تورکیاوە دەگەڕێتەوە بۆ ئاسەواری چەند سەد ساڵەی دەسەڵاتداری عوسمانییەکان لە عێراق و کوردستاندا[28]، ئەو تورکمانە توندڕەوانە خۆیان بە شارستانی و پێشکەوتووو خەڵکی تریان بە تایبەتی کورد بەدەشتەکی و دواکەوتوو، نەخوێندەوار دەزانی، ئەوان باوەڕیان نەدەهات کوردیش میللەتێکەو هەموو مافێکی میللەتانی دیکەی هەیە، پێیان سەیر بوو کوردیش خاوەنی رۆشنبیری و کەلتوورو توانای ئابووری و سیاسی و دەسەڵات بێت، تەنها کوردی هەژارو بێ دەسەڵات و دواکەوتویان پێ باش بوو. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە کورد لە شاری کەرکوکدا پێگەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیری و سیاسی دیارو

بەرجەستەی هەبوو. زۆربەی تەکیەو خانەقاو دیوەخانەکانی شار لەلایەن مەلاو شێخ و زاناو کەسایەتی ناسراوی کوردی بەرێوە دەبردرا، سەرمایەدارو کەسانی شارەزا لە بواری کارو کەسابەتدا دەوریان دەگێرا لە ئاوەدان کردنەوەو بوژانەوەی شارەکەدا. دیارە کوردیش وەکو هەموو میللەتێکی دیکە خەڵکی هەژارو نەخوێندەواری کەم نەبووە، ئەو بیر کردنەوە توندەی باسی دەکەین هەموو تورکمانەکانی نەدەگرتەوە، سەرەتا تەنها کەمایەتییەکی خوێندەوارو تێکەڵ بە فەرهەنگی پان تورکیزم[٢٩] و کەمالی دەوریان دەبینی و زۆربەی خەڵکی تورکمان پەیوەندییەکی ئاساییان لەگەڵ کورددا درێژە پێ دەدا وەکو پێشتر گرێ و گۆڵێك لەو پەیوەندییانە لەنێوان زۆرینەی تورکمان و کورد بەدی نەدەکرا، بەڵام و زۆر بیرو بۆچوونی (تورکی – کەمالیزم) لەناو تورکمانەکاندا لەزیاد بووندا بوو بەرامبەر بەهەوڵ و کۆششی کورد بۆ پاراستنی پێگەی خۆیان و گەشە کردنێکی دیارو بەهێزی کورد لە رووی ئابووری و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ژمارەی دانیشتووانەوە. راستی ئەو کاتانە ململانێیەکی شاراوە هاتە پێشەوە لەنێوان تورکمانی سەر بەبیری نەتەوەیی توندی کەمالی و کوردەکان کە دەیانەویست ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان بپارێزن و گەشەش بکەن.

لە سەرەتاوە ململانێکە لە چوارچێوەی لەیەك گەیشتن و رەچاو کردنی بەرژەوەندی یەکتر دەرنەدەچوو، بەڵام دەست تێوەردانی دەرەکی و هاندانی عەرەبی شۆڤینزم بۆ دروست کردنی کەلێن لەنێوان تورکمان و کورددا رۆڵێکی نێگەتیڤی گێڕاو ئاسەواری خراپی لێ کەوتەوە لە پاشەرۆژی پەیوەندی دێرینەی تورکمان و کورددا.

سروشتی کۆمەڵگای تورکمان[٣٠] لە کەرکوك و شوێنەکانی دیکەی نیشتەجێ بوونیان ئەوکاتانەی لێرەدا باسی دەکەین و دەکرێت بڵێین تا ئەمڕۆش، سروشتێکی تایبەتی و جیاوازە، ئەوان بەگشتی کۆمەڵگاکەیان کراوە نییە بەسەر دەورووبەری خۆیاندا، بیری موحافیزە کارانەیان بەسەردا زاڵە، رۆشنبیری و داب و نەریتی تایبەتیان هەیەو دەیپارێزن، بەئاسانی دەست بەرداری بیرو قەناعەتی خۆیان نابن ئەگەر ئەو قەناعەتە هەڵەش بێت. خۆشگوزەرانی و ئارامی و ئاساییشی ژیانی رۆژانەو بەختیاری خێزانیان زۆر لا مەبەست و گرنگە بەزۆری هەوڵ دەدەن لە سەرەتای ژیانی گەنجایەتیان داهاتێکی جێگیر بۆ خۆیان دابین بکەن بە دامەزراندن لە فەرمانگەیەك یان فێربوونی کارو سەنعەتێك، لە کڕین و فرۆشتنی ناو بازاڕدا شارەزای باشیان هەیە، ئەوەندەی پێویست نەبێت بەشداری و تێکەڵاوی بابەتی مەترسیدار لەسەر ژیان و بەرژەوەندیان نابن، رێز لە یاساو دەسەڵاتی فەرمی حکومەت و دەوڵەت دەگرن. ئەگەر ناچار نەبن بەدەستی خۆیان و لە دەرەوەی یاساو دادگا کێشەکانیان یەکلا ناکەنەوە، بەڵام ئەگەر پێویست بکات چ لە رێگای کەسانی خاوەن دەسەڵات یان بە شێوازی دیکە دەگەنە ئەنجامێك لە قازانجیاندا بێت. ئەوان هەمیشە لەناخەوە هەست بە مەترسییەکی شاراوە دەکەن، مەترسی لەسەر ژیان و گوزەران لەسەر ئایندە لەسەر بەرژەوەندییەکانیان، زۆر جاریش ئەو مەترسیە (وەهمیە)وە هیچ بنەمایەکی نییە. بێ گومان بەرامبەر بە کوردیش مەترسیان هەیەو لە دەست نیشان کردن و رێگای چارەسەرو کاریان بۆ نەهێشتنی ئەو مەترسیە تووشی هەڵە دەبن، هەڵەی زەقیان لەو مەسەلەدا دۆستایەتییە لەگەڵ نەیارانی کوردو هاوکاریان لەگەڵ ئەوانەی لە بنەرەتدا دوژمنی کوردو تورکمانن، گەران بەدوای بەهێز کردنی پێگەی خۆیان بەرامبەر بەو مەترسیە وەهمییە تا ئەمڕۆ ئەنجامێکی سوود بەخشی بۆ برا تورکمانەکان نەبووە، چونکە دژایەتی کوردو دۆستایەتی تورکمان دەکەن و هاوپەیمانیەتییەکەیان لەسەر فێڵ و تاکتیك بونیاد نراوە. بۆ نموونە پاش تەمموزی ساڵی (١٩٥٩) عەرەبە شۆڤینزمەکانی کەرکوك و دەورووبەری سوودیان لە ئەنجامی رووداوەکانی (١٤)ی تەمموزی ساڵی (١٩٥٩) وەرگرت و خۆیان لە تورکمان نزیك کردەوە، بۆ قووڵ کردنەوەی ناکۆکی نێوان کوردو تورکمان، لەوەشدا تا رادەیەك سەرکەوتوو بوون، بەڵام پاش ئەوەی لە تەمموزی ساڵی (١٩٦٨) جارێکی دیکە بەعسییەکان دەسەڵاتیان گرتەوە دەست، درێغیان نەکرد لە چەوساندنەوەی تورکمان و کاریان دەکرد بۆ سڕینەوەی پێناسەی تورکمان لە عێراقداو زۆرێکی تورکمانیان ناچار کرد خۆیان بەعەرەب ناونووس بکەن، جگە لەوەی کەم نەبوون ئەو تورکمانانەی لە سێدارە دران یان دەربەدەر کران هەر لەلایەن هاوپەیمانەکانی دوێنێی ئەو برا تورکمانانەوە.

دوور لە کەرکوکیش لە دەرەوەی سنوورەوە هاندان و بەڵێنی گەورەو زۆر دەدرایە تورکمان کە پارێزگارییان لێ دەکرێت و رێگا نادرێت بەعسییەکان درێژە بەسیاسەتەکانیان بەرامبەریان بدەن، راستی ئەو بەڵێنانە هیچی لێ سەوز نەبووە، جگە لە نەهامەتی بۆ تورکمان، بەرادەیەك سەرانی رژێم لە وەڵامی داخوازی لێپرسراوێکی پایە بەرزی دەوڵەتی تورکیا داخوازی کردبوو لە بەرژەوەندی عێراق و تورکیادایە مەسەلەی تایبەتمەندی تورکمان لە عێراقدا رەچاو بکرێت، راشکاوانە پێیان راگەیاند کە لە عێراق تەنها عەرەب و کورد هەیە. ئیتر ئەوانیش بێ دەنگیان هەڵبژارد بەرامبەر سیاسەتی توندو تیژی بەعس دژی تورکمان و لەپێناو بەرژەوندییەکانی خۆیان تورکمانیان دا بەگورگانە خوارد.

جێگای سەرنجە ئەو هەرەشەو هات و هاوارەی دەرەوەی سنوور ئێستاش بەردەوامەو ئێستاش هیچی لێ سەوز نابێت، جێگای سەر سوڕمانە برا تورکمانەکان لە واقیعی ئێستای هاوکێشە سیاسییەکان لە عێراق و دەورووبەری و لەبەرژەوەندی دەوڵەتان نەگەیشتوون. تاقیکردنەوە سەلماندی هیچ هێزێکی دەرەکی ناگاتە دان پێدانانی ئەو خەونەی کە ئەو تورکمانانە بەدروست کردنی ئیمپراتۆریەتێکی عوسمانی ویلایەتێکی موسڵی سەر بە تورکیاوە دەبینن، چونکە ئەو بیرۆکەیە بە توندی لەلایەن عەرەبە قەومییە دۆست و هاوپەیمانەکانی ئێستای تورکمانە توندەکانەوە جێگای قبوڵ نییەو لەنێوان دەرەوەی سنوورو برا تورکمانەکاندا دیوارێکی بڵندی بەرگری میللەتێکی خاوەن هێزو ئیرادەو تاقیکردنەوە هەیە کە رێگا لە داگیر کاران دەگرێت و سەردەمەکەش زۆر جیاوازە لە رابوردوو.

نەخەو بینین بەهاتنی سوپای دەرەوەو نەهاوپەیمانی لەگەڵ خەڵکانێك کە بەئاشکرا فێڵیان لێ کردوون، ئەمڕۆ دادی برا تورکمانەکان نادات، نزیکترین دۆستو خاوەن بەرژەوەندی هاوبەش کوردە بۆ ئەوان. دەکرێت بە بەخشینی متمانە بە یەکتر کوردو تورکمان بگەنە رێککەوتنو پێکەوە سەربەرزانە لەسەر خاکی هەرێمی کوردستان ژیانێکی پڕ لە بەرهەمو پێشکەوتنو یەکسانی بەسەر ببەن... بەلای هەندێ لەبرا تورکمانەکانەوە قورسە لە بوارە جیاجیاکانی ژیاندا کورد ململانێی ئاساییان لەگەڵدا بکاتو پێشکەوتن بەدەست بهێنێ، بەداخەوە هەندێکیان وا بیر دەکەنەوە هەموو پێشکەوتنو گەشە کردنێك کورد بەدەستی بهێنێ ئەوە بەزیانی ئەوان تەواو دەبێت، بەلاّم زۆر بەئاسانی هاتنی هەزاران ماڵی عەرەبو داگیر کردنی خانووو زەویو زاری کوردو تورکمانی کەرکوكو پێشکەوتنی دیارو ئاشکرای ئەو عەرەبانە لەچەند ساڵی حوکمرانی بەعسیداو لەسەر حیسابی خودی تورکمانو کورد بەرەواو راست دەزانن‌و بەمەترسی دانانێن لەسەر خۆیان ئەوانە بە حەساسیەتێکی زیاد لە پێویستەوە تەماشای رەوتی پێشکەوتنو هەوڵو تەقەلاّی کورد دەکەن بۆ وەدەست هێنانی مافە رەواکانیان[31].

بۆ خۆ پاراستنو بەربەرەکانیی کەم کردنەوەی ئەو مەترسیو حەساسیەتەی لە هۆشی خۆیاندا دروستیان کردووە رێگاو شێوازی جیاواز دەگرنە بەرو پەنا بۆ ئەم لاو ئەو لا دەبەن، کە تا ئەمڕۆ ئاکامێکی سوود بەخشی لێ نەکەوتۆتەوە بۆ ئەو برا تورکمانانە، ئەوەندی لە شۆڤینزمە عەرەبەکان نزیك دەبنەوەو گوێیان لێ دەگرن یان ئەوەندی هیوایان بە یارمەتیو کۆمەکی دەرەوەی سنوور لەگەڵ براو دۆستو هاوشارو هاونیشتمانەکەی خۆیان کە کوردە گفتوگۆ بکەنو لە نیاز پاکیو دۆستایەتی ئەوان بگەن زۆر لە قازاجیانە.

تورکمان مافی خۆیەتی بەسەراحەت وبێ پێچو پەنا پرسیار لە برا کوردەکانی بکات رایان چیە سەبارەت بەپێکەوە ژیانیان، رای کوردان لەسەر مافی رەوای تورکمان چیەو زەمانەتەکان بۆ درێژە پێدانی ئەو پێکەوە ژیانە لەسەر بنەمای یەکسانی چۆنەو ئالیەتی جێ بە جێ بوونیان چۆنە؟ ئەمڕۆ دەسەلاّتو پەرلەمانو رای گشتی هەیە، زۆر ئاساییە ئەو باسو داخوازیانە لەنێوان تورکمانو کورددا بکرێتو راستگۆیانەو لە رێگای گفتوگۆوە بگەنە ئەنجامێك سوودی هەردوولای تێدابێت. خۆ ئەگەر سوور بن لەسەر سیاسەتی هەڵەی چەند ساڵی رابوردووو ئێستای هەندێکیانو بەبیرێکی تەسکی کەمالیزمانەو بەهاندانی شۆڤینزمی عەرەب وا بزانن دەتوانن ئیرادەی میللەتی کورد بشکێنن، بەداخەوە ئەوە رێگایەکی هەڵەیەو پڕ لە زیانو ماڵ وێرانیە. بۆ میللەتی کوردیش پێویستە بە سەراحەتو بەبێ پێچو پەنا بۆ دۆستە تورکمانەکان روونی بکاتەوە کە ئەگەر ئەوان وا دەزانن لە رابوردوودا هەڵسوکەوتی نا شایستەو بێ دادیان لەگەڵ کراوە، ئەوە رای هیچ حیزبو گرووپو لایەنێکی سیاسی کورد نەبووەو نییە، ئەگەر شتێك رووی دابێت زیانی زۆرتر بۆ کورد بووە، بۆ ئاییندەش دەبێ تورکمان دڵنیا بکرێت کە کورد بەراستی دۆستایەتی تورکمان دەکاتو بە هاووڵاتی پلە یەکی کوردستانی دەزانێتو زیان گەیاندن بە تورکمان زیانە بۆ کوردو تورکمان بۆی هەیە وەکو هاووڵاتیەکی رەسەنو گرنگی هەرێم دەوری شایستەی خۆی ببینێ، ئەوانەش بە یاسا لە پەرلەمانی کوردستاندا جێگای بکرێتەوەو پیادە بکرێت. کورد لە واقیعی ئەمڕۆی کوردستانو عێراقو دەوروبەرو جیهاندا دەبێ لێبووردووو بەخشندە بێت بە خەڵكو دەسەلاّتو حیزبو پەرلەمانەوە، بڕیار بدات بە پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکماندا بچێتەوەو پێکەوە لاپەرەیەکی نوێ بکەنەوە لەسەر بنەمای یەکسانی تەواو لەنێوانیاندا.

لە ماوەی (٣٥) ساڵی رابوردوو تا ئەمڕۆ لە کاتو شوێنی جیاوازدا گفتوگۆم لەگەڵ دۆستو برادەری تورکمان بەسەراحەت کردووە، دەربارەی هۆی دووره پەرێزیان لە نزیکترین دۆستو دراوسێیان کە کوردە، لە هۆی هەڵوێستی تەمو مژاویان لەبەر داوا رەواکانی گەلی کورد لە کوردستانی باشووردا، دەربارەی پشتگیری هەندێکیان لە هەڵسوکەوتی رژێمە شۆڤێنییەکانی بەغدا لە هۆی دانەبڕینیان لە عەقلییەتی سەد ساڵ پێشو هەست نەکردن بەو گۆڕانە گەورانەی بەسەر هاوکێشە سیاسیو کۆمەلاّیەتیو ئابووری ناوچەکەدا هاتووە بە عێراقو کوردستانەوە لە هۆی سوود وەرنەگرتنیان لە هەلومەرجی نوێی کوردستانو عێراق بۆ هاتنە پێشەوەو هەوڵدان بۆ دروست کردنی پەیوەندییەکی راستو پتەو لەنێوان کوردو تورکمان لەسەر بنەمای پاراستنی تەواوی مافە رەواکانی تورکمان لە هەرێمی کوردستانو گفتوگۆ دەربارەی چۆنیەتی مسۆگەر کردنی ئەو مافانەی بەرژەوندی تورکمانی تێدا بە تەواوی پارێزراو بێتو گەلێ پرسیاری دیکە؟!

هەندێ لەو دۆستانە لەگەڵ ئەوەدا بوون کە راستە جیهانو دەوروبەرو وڵاتیش گۆڕانی بەسەر هاتووە، پێویستە ئەوانیش بیر کردنەوەو هەڵوێستیان بگۆڕنو لاپەرەیەکی نوێ بە هاوکاری کورد لە پەیوەندی نێواندا بکرێتەوە، لەسەر بنەمای یەکسانیو پاراستنی بەرژەوەندییەکانو مسۆگەر کردنی مافەکانی تورکمان لە هەرێمی کوردستاندا، ئەوان وا ئەزانن کورد نزیکترینو واقعیترین دۆستو هاوپەیمانی تورکمانە، بەلاّم بۆ خۆیان دەڵێن: ئێمە کە بەو شێوە بیر دەکەینەوە تا ئێستا کەمایەتینو نەمانتوانیوە ئەوەندە کاریگەر بین کە رای گشتی تورکمان بەو ئاقارە ئیجابیەدا ببەین. بەشی کەیان پاش نەمانی سەدامو رژێمەکەی دەڵێن ئێمە چاوەروانین ئێوە دەستپێشخەری بکەنو بێنە پێشەوەو مەترسیەکانمان بڕەوێننەوەو دڵنیامان بکەنەوە کە بەرژەوەندییەکانمان لە سێبەری ئێوەدا مەترسی لەسەر نابێت، ئەوان بەسەراحەت دەڵێن بەداخەوە پاش نەمانی رژێمی بەعس تا ئەمڕۆش بە پێچەوانەی لێدوانی رەسمیو بەڵێنەکان رۆژانە کاری ناشایستەمان بەرامبەر دەکرێت. سەرەتا باشە بنەبڕی ئەو کارو کردەوانە بکرێتو ناکرێت ئێوە وا بزانن چەند حیزبێکتان بە ناوی تورکمانەوە قووت کردوەتەوە تەنها ئەوان بە نوێنەری هەموو تورکمان

بزانن، ئەوان نوێنەری بەشێکی کەمن ئێوە لەگەڵ زۆرینەدا ڕاستەوخۆ مامەڵە بکەن. بەشی دیکەی ئەو تورکمانانەی گفتوگۆمان لەگەڵ کردوون، ئەڵێن لە ساڵی (١٩٥٩)وە بەرامبەر ئێوەی کورد (گرێ کوێرە - عوقدەمان) بۆ دروست بووە، تاقیکردنەوەشمان هەیە، باشتروایە لێگەڕێن بزانین ڕووداوو زەمانە چیمان بەسەر دێنێ؟ ئێوەو ئێمەش بیرێکی قوڵی لێ بکەینەوە، ئێوە چەند ساڵ زیاترە زۆربەی دەسەڵاتیان لە کەرکوك بەدەستە، هەقە بە خۆتانا بچنەوە چەند دادو یەکسانی بەکار هێنراوەو بەرپرسەکانتان بەراستی کاریان کردووە بۆ پتەو بوونی برایەتیو تەبایی نێوانمان یان بە پێچەوانەوە ئێمە پێمان وایە وەدەست هێنانی برواو متمانەی ئێمەو ئێوە کاری جیدی هەردوولامانی دەوێ، بەڵام خەڵك بەپارەو وەزیفە کرینو دروست کردنی قەوارەی سیاسی شتێکی دیکەیە ئێوە ڕاو تاقیکردنەوەی خۆتان هەیە لە ساڵانی ڕابوردوو بەرامبەر ڕژێمەکانی عێراقو حیزبە کارتۆنییەکان کە بەزۆر ناویان لێ نابوون نوێنەری میللەتی کورد!!

لەگەڵ ئەو دۆستانە تا ئەمرۆش گفتوگۆمان درێژەی هەیەو ناشکرێت تەنها بەباس کردنی برایەتیو تەباییو سۆزو خزمایەتی گفتوگۆکە دەست پێبکاتو کۆتایی بێت، بەڵکو بابەتەکە دانوستانو بەرژەوەندی هاوبەشە، کوردو تورکمان لە کەرکوكو هەندێ شوێنی دیکە زۆر تێکەڵاونو ناکرێت پەیوەندییەکی لەرزۆكو تەمو مژاوی وەکو ئەوەی ئێستا درێژەی پێبدرێت، دەبێ بگۆڕێتو لەسەر بنەرەتێکی واقعیانەی بە کردەوە بنیات بنرێتەوە. وەڵامی ئەو برایانەو ڕاو بۆچوونی جیاوازی تریش کە لە بەشەکانی کەی ئەم نووسنەدا باسیان دەکەم لێرەو لەوێ دەنوسرێتو دەوترێت، دروست بن یان نا، مافی خۆیانەو ئازادن لە دەربڕینیداو لە جێگای خۆیدایە ئێمە ئاگامان لە ڕای ئەو برایانە بێت بەبێ ڕتوشو ڕازاندنەوە، بۆ ئێمەش وەکو کورد ڕەوایە ڕای خۆمان هەبێتو دەبێ بەقووڵیو ڕاستگۆیانە لەگەڵ خۆمان ئاڵوگۆڕی بیرو ڕا بکەینو بە ئەنجامی سوود بەخشو بەکردەوە جێ بەجێ بکرێتو پێویستە هەوڵ بدەن لە ڕوانگەی هەست کردن بە لێپرسینەوەو هەستیاری بارەکە کار بکەین بۆ ئەوەی ئەو ترسو دڵە ڕاوکێو نەبوونی متمانە لای برا تورکمانەکان کە لە بیرو هزریاندا جێگای خۆی کردۆتەوە برەوێنینەوەو هەموو شێوازێکی گونجاو بەکار بهێنین بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو پرۆسەیەو هەنگاوی بوێرانە هەڵبێنین. لەوانەیە لە سەرەتاوە بەرامبەر کارێکی وا گرنگدا ڕووبەڕووی پێینەزانینو تێنەگەیشتن ببینەوە، بەڵام سەرئەنجام بەرامبەر تێدەگات کە کورد بەراستی دەیەوێت لە پێگەی تواناو کێشەیەکی ئاڵۆزی پەیوەندیدار بە ئایندەوە چارەسەر بکاتو ئامادەیی تێدایە دەستکەوتی گەورەو لێبوردەیی پێشکەش بکاتو لە هەندێ بەرژەوەندی خۆشی دەست هەڵگرێت بەرامبەر وەدەست هێنانی ئەنجامی هەوڵەکەی بۆ بنیاتنانی پەیوەندییەکی ستراتیژی لەنێوان کوردو تورکمان.

لە ماوەی (٨٠) ساڵی ڕابوردوو ئێمە ناهەقیو ستەمی زۆرمان بەرامبەر کراوە، بەڵام خەباتمان بۆ ئەوەیە کەرکوكو ناوچەکانی دیکە بگەڕێنەوە سەر هەرێمی کوردستانو تورکمانیش بێگومان بەشێکی سەرەکیو ڕەسەنی پێکهاتەی گەلی کوردستانن. دەبێ لە ئێستاوە شێوەی مامەڵەمان لەگەڵ ئەو برایانە بە جۆرێك بێت بۆیان بسەلمێنین ئێمە دەسەڵاتدارێکی ستەمکار نینو لە مەسەلەی پێکەوە ژیانو مافی مرۆڤ و دیموکراسیەت گەیشتوینو هەرگیز قایل نابین پاش تاقیکردنەوەی چەوساندنەوەمان لەلایەن شۆڤێنیەتی عەرەبییەوە ڕێگا بە خۆمان بدەین قەومو نەتەوەو خەڵکی دیکە لەلایەن ئێمەوە بچەوسێنرێنەوە.

بە هاندانی دوژمنە تەقلیدیو دێرینەکانی میللەتەکەمانو ئەنجامی هەڵسوکەوتو مامەڵەی نادروستمان لەگەڵ کێشەی تورکمان لە کەرکوكو تێنەگەیشتنی بەشێك لە تورکمانەکان خۆیان لەو کێشەیەدا، ئەمرۆ تورکمانەکانی کەرکوكو بە تایبەتی ئەوانەی (بەرەی تورکمانی) خۆی بەدەم ڕاستیان دەزانی وا تێگەیشتوون یان تێگەیەندراون کە جگە لە هاوپەیمانەتیو هاوکاری نەیارانی کورد بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانیانو وەدەست هێنانی مافەکانیان ڕێگای دیکەیان لەبەردەستا نییە. لەکاتێکدا بەشێك لە تورکمان بۆ خۆیان ئەوە بە تێگەیشتنو خوێندنەوەیەکی هەڵە دەزانن، بەڵام ئەمانە هێشتا ماویانە ئەوەندە کاریگەر بن لەناو کۆمەڵگای تورکماندا، کە شێوەی بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتی تورکمان ببەن بەلای هاوکاریو تەباییو پێکەوە ژیانێکی ئاساییو پڕ لە دادو یەکسانی لەگەڵ کوردو دراوسێکاندا.

چەندین ساڵە لە نزیکەوە ئاگادارم لە کێشەی کەرکوكو گەیشتومە ئەو ئەنجامەی کە پەیوەندیو بەرژەوەندی هاوبەشی نێوان پێکهاتە سەرەکییەکانی کەرکوك جیاوازیو تایبەتمەندی خۆیان هەیە بەتایبەتی مامەڵە لەگەڵ تورکمانو عەرەب لەلایەن کوردەوە، پێویستە بەپێی ئەو تایبەتییانە بێت. عەرەب بەگشتی جگە لە کەمایەتییەك کە ماوەیەکی زۆرە نیشتەجێی کەرکوکن لە ناخەوە خۆیان بەدانیشتوی کەرکوك نازانن، ئەوان شانازی بەتیرەو تایەفەو ناوچەو قەبیلەی خۆیانەوە دەکەن، لەناوەڕاستو خوارووی عێراقو ڕۆژئاوای کەرکوکەوە هاتوون یان هێنراون بۆ مەبەستێکی سیاسی بەرامبەر دەسکەوتو پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیو سیاسیو خزمەت بە ئامانجەکانی شۆڤێنیزمی عەرەبی، ئەوان هەرگیز خۆیان بە خەڵکی ڕەسەنی شارەکە نەزانیوەو شانازیشیان بە کەرکوکی بوونەوە نەکردووە. ئەوان تێگەیشتوون ئایندەیەکی دیارو ڕووناکیان لە پێشدا نییەو چاویان لە گەڕانەوەیە بۆ شوێنی پێشوویان. پەیوەندی کۆمەڵایەتیو ئایینیان لەگەڵ کەرکوکی یان غەیری خۆیاندا نییە یان زۆر لاوازە، بەڵام بەهۆی بارودۆخی شێواوی عێراقو دەستێوەردانی دەرەکیو هاندانی ئەم لایەن یان ئەویترو بەرامبەر دەسکەوتی مادیو بەڵێنی قەبەو بێ بنەما ماونەتەوەو چاوەڕوان دەکەن کێشەی عەرەبی هاوردە بە ڕەسمی یەکلا ببێتەوەو چۆنیەتی گەڕانەویان پابەندە بەجێ بەجێ بوونی مادەی (١٤٠) لە دەستووری هەمیشەیی عێراقدا.

عەرەبەکانی حەویجە ناوچەکەیان کە بەراستی وەکو واقیع ئەمرۆ بەناوچەیەکی عەرەب نشین دەژمێردرێت تیرەو تایەفەکانیان لە کەرکوکەوە دوور نین، زەوی‌و دێهات‌و کێڵگەکانیان لەبەر دەستیاندایە دەرگای شارەکانی موسڵ‌و شەرگات‌و تکریت‌و بێجیان لێ دانەخراوەو قولایان لەوێ دایە هەرکات تەنگاو بکرێن دەچنەوە ناو قەبیلەو زێدی خۆیان، ئەوان هەوڵ دەدەن رێگر بن لە گەرانەوەی عەرەبی هاوردە بۆ شوێنی پێشوویان بۆ مسۆگەر کردنی زۆرینەیەکی عەرەبی لە شارداو بەکارهێنانیان بۆ مەبەستی سیاسی. لەلایەکی دیکەوە بەهەموو شێوەیەکی شەرعی‌و ناشەرعی کار دەکەن‌و هەوڵ دەدەن سوود لە کێشەو ساردی نێوان تورکمان‌و کورد وەربگرن‌و ئەو ساردیە بگۆرن بۆ ناکۆکی‌و ململانێی توندو تیژو بێ باوەری‌و گومان‌و دوو دڵی لەنێوان کوردو تورکماندا قووڵ بکەنەوە، ئەم سیاسەتە لە کاتێکدا بەداخەوە لەلایەن هەندێ لە تورکمانەکان پشتگیری‌و تەرویجی بۆ دەکرێ بۆ پەیدا کردنی پشتگیری رای گشتی، سووریش دەزانن سیاسەتێکی سەرکەوتوو نابێت‌و ناواقعیەو دوورە لە راستگۆییەوە، چونکە عەرەبە شۆڤێنییەکان بێ ئەوەی ئاورێك لە تورکمان بدەنەوە لەکاتی تەنگانەدا بێ سێ‌و دوو بە جێیان دەهێڵن‌و خۆیان بەرەو قولایی تیرەو هۆزەکانیان تێی دەتەقێنن، ئەم تاقیکردنەوەیەش لە ماوەی تەنیا شازدە ساڵدا دووجار دووبارە بۆتەوە: ساڵی (١٩٩١) لەکاتی راپەریندا بۆ یەکەمجار لە مێژوو هاوچەرخەدا شەری کەرکوك ئازاد کرا، جگە لەو تورکمانانەی راستەوخۆ جێگای متمانەی بەعس بوون‌و بەرپرسی گەورە بوون هەڵاتن کە ژمارەیان زۆر کەمیش بوو زۆرینەی تورکمانەکان لە شوێنی خۆیان مانەوەو بەگەرمی پێشوازیان لە هێزی پێشمەرگە کرد، پاشان کە بەعسییەکان گەرانەوە ئەو تورکمانانەی لەگەڵ کۆرەوی کورد شاریان بەجێهێشت، بەشێکیان پاش گەرانەوەیان بۆ کەرکوك سزا دران‌و ماڵ‌و موڵکیان دەستی بەسەردا گیرا. بەرامبەر بەوە عەرەبەکانی کەرکوك زۆرینەیان لەگەڵ لەشکرو دام‌و دەزگای بەعسییەکاندا هەڵاتن‌و چوونەوە دێهات‌و شارەکانی خۆرئاوا باشووری کەرکوك، پاشان لەگەڵ هێزی داگیرکەرو درندەی بەعسدا گەرانەوەو درێغیان لە تاڵان‌و کوشتن‌و خراپەکاری نەکرد، بەماق خۆیان دەزانی ماڵ‌و موڵکی خەڵکی داگیر بکەن چ کورد بێت یان تورکمان بەلایانەوە گرنگ نەبوو.

بۆ جاری دووەم لەکاتی پرۆسەی ئازادی عێراقدا هەمان هەڵوێستی عەرەبی نیشتەجێی کەرکوك دووبارە بووەو، سەرەتا زۆربەی عەرەبی هاوردەو هاوکارانی بەعس‌و خاوەن پلەو پایەو ئەوانەی تاوانیان بەرامبەر دانیشتووانی کەرکوك ئەنجام دابوو هەڵاتن، بەڵام تورکمان ژمارەیەکی زۆر کەم نەبێ لە شوێنی خۆیان مانەوەو پێشوازیان لە سیستمی نوێ کردو پاشان عەرەبەکان زانیان کورد تۆڵەیان لێ ناکاتەوە بە هەمان عەقڵیەتی پێشوو گەرانەوەو سوودیان وەرگرت لە ململانێی حیزبیی ناشەرعی کوردان‌و تا ئێستاش بە هیوای گەرانەوەی دەسەڵاتی بەسەرچووی بەعسن‌و کاریش بۆ ئەوە دەکەن، لە هەڵاتن‌و گەرانەوەیاندا هیچ پرس‌و راوێژێکیان بە تورکمان نەکردووە، بۆ ئاییندەش حیسابیان بۆ ناکەن.

دەبێت لێرەدا بگوترێت هەڵسوکەوتی نامەسئولانەی هەندێ بەرپرس‌و کەسانی گێرەشێوێن بەرامبەر خەڵکی لە کەرکوك‌و بەتایبەتیش تورکمانی ئاسایی لە راپەرینی ساڵی (١٩٩١)و پرۆسەی ئازادی کەرکوك لە ساڵی (٢٠٠٣)دا ئاسەوارێکی هێجگار نەرێنی لای تورکمانەکان بەجێهێشتووە. ئەوان لە سەرەتا لەلایەن شۆڤێنزمی عەرەبی ترسێنرابوون لە کوردو بۆ خۆشیان مەترسیەکی وەهمیان هەبوو، ئەم هەڵسوکەوتە ئەگەچی لەسەر پێشمەرگەو حیزب‌و لایەنە شۆرشگێرەکانی کورد ناژمێردرێن، بەڵام بەشێك لە مێژووی پر لە سەروەری شۆرشەکانی کوردو مامەڵەی مرۆڤانەی لەگەڵ خەڵکدا شێواندووە.

تورکمان لە کەرکوکدا وەك عەرەب نین‌و هەمان تایبەتمەندی عەرەبیان لە کەرکوکدا نییە، چونکە ئەوان زەوی‌و لەوەرگاو خاك‌و ئاوو تیرەو تایەفەو قولاییان بە دەستەوە نییە، چارەنووسیان بەستراوە بەو شوێنانەی تێیدا نیشتەجێ بوون، سەرەتا تورکمان وا تێگەیەنرابوون سوپای دەرەکی دێتە کەرکوك‌و پشتگیریان دەکات، پاشان بۆیان روون بووەوە ئەوە ناکرێت‌و ئاسان نییە، ئینجا هاوپەیمانیان لەگەڵ عەرەبەکانی حەویجەو هەندێ لە عەرەبە هاوردەکان گرێدا، ئەوەش گرفت‌و کێشەی زۆری بۆ دروست کردن‌ولە ئاییندەش زیاتر تورکمانەکان روون بێتەوە کە عەرەبەکان تەنها بۆ بەرژەوەندی خۆیان لێیان نزیك دەبنەوەو لەکاتی تەنگانەدا لایەکیان لێ ناکەنەوەو برا تورکمانەکان یان بەشێکی زۆریان وا تێگەیشتوون ئەگەر بەم لاو ئەو لادا هەڵپە نەکەن کورد دەیانخوات، سرینەوەی ئەو تێگەیشتنە هەڵەو پر مەترسیە کاری زۆر ووردو بەبەرنامەی پێویستە بەرادەی یەکەم لایەن کوردو پاشان تورکمان. تاقیکردنەوەکانی سەردەمی بەعس ئەو چەند ساڵەی پاش نەمانی دیکتاتۆریەت سەلماندوویەتی کە کوردو تورکمان چارەنووسیان پێکەوە گرێ دراوەو دەبێت سەرەتاکانی یەکتر خوێندنەوەو قایل بوون بەماف رەوای یەکتری، بناغەی گفتوگۆیەکی هێمنانە بێت لەنێوانیاندا دوور لە پاڵەپەستۆو ترساندن دەستێوەردان‌و کلك گرێدان‌و فێڵی ئەم لاو ئەولا بۆ مەبەستی گەیشتن بە ئەنجامێك بەرژەوەندی هەردوولا مسۆگەر بکات. ئەم بابەتە لەبەر ئەوەی تەرخان کراوە بۆ هەوڵدان بەرەو چارەسەر کردنی پەیوەندییە ساردەکانی ئێستای نێوان کوردو تورکمان‌و دۆزینەوەی رێگاچارەی گونجاو، ئەوەندە لەو هێڵە دەرناچێت‌و خۆی لە تەوەری باسی پەیوەندی نێوان کوردو کلدان‌و ئاشوری‌و ئەرمەن نەداوە، چونکە ئەو پەیوەندییانە ئاساییەو گرفت‌و ئاڵۆزی ئەوتۆ لەنێوانیاندا نییە لەلایەکەوەو ئەو باسە هەڵدەگرێت‌و لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی بۆ تەرخان بکرێت.

کەرکوك کێشەی ناوەندی هەموو خەڵکی کوردستانە، تاقیکردنەوەیەکی مێژووییە بۆ ئێمە وەکو نەتەوە، پێویستە لەم تاقیکردنەوەیەدا سەربکەوین‌و کوردستانی بوونی کەرکوك مسۆگەر بکەین. کوردستانی بوونی کەرکوك زامن کردنە بۆ ئاییندەو ئاسایشی نەتەوایەتیمان‌و نەوەکانی

دواڕۆژمان، کورد بۆ وەدەستهێنانی ئەنجامێك کە شایستەی ئەو هەموو قوربانییو خەباتە بێت چەند بەیەکگرتوو بێت چەند سینگ فراوانو ژیرانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەینو دبلۆماسیەت بەکاربێنین هێشتا کەمە.

بە نەمانی دیکتاتۆریەتو تێکشکاندنی نەخشەکانی بەعس کێشەی کەرکوك پێی ناوەتە قۆناغێکی نوێی جیاواز لە قۆناغەکانی پێشوو، مامەڵە کردن لەگەڵ ئەم قۆناغە هەستیارە ئەو پەڕی تواناو لێهاتوویی دەوێت. پێداگرتن لەسەر کوردستانی بوونی کەرکوك دەبێت شان بەشانی بروا و کاری دروستو تۆکمە بێت لەگەڵ ڕەچاو کردنی هەبوونی تورکمان وەکو بەشێکی گرنگی بنەڕەتی پێکهاتەی شارەکەو دابین کردنی هەموو مافێکی ڕەوا بۆیانو لەبەر چاوگرتنی بوونی کلدو ئاشوورو ئەرمەنو عەرەب لە کەرکوکی پێکەوە ژیاندا.

پێویستە هەموو لایەك بەراشکاوی بە حیزبو دەسەڵاتو ڕۆشنبیرانەوە دان بەو ڕاستییەدا بنێین کە لە قۆناغی پاش ڕووخانی ڕژێمی بەغدا تا ئەمڕۆ کارو هەوڵەکانمان لە کەرکوکدا وەکو پێویست نەبوو، ململانێی حیزبی لەسەر دەسکەوتی بچووکی حیزبایەتی هەڵەیەکە پێویستە درێژەی پێنەدرێت.

بەرنامەو کارەکانی چەند ساڵی دوای نەمانی بەعس لە کەرکوکدا جێگای خۆیەتی لە ئێستاوە پیاچوونەوەیەکی جیدی تێدا بکرێتو هەڵەکان دووبارە نەکرێتەوە. پێویستە بەرنامەی ووردو زانستیو کردارو نەخشەو پلانی دروست دابڕێژرێنو کاری ڕاستو جیدی بکرێت بۆ جێ بەجێ کردنیان، بابەتی قایل کردنی برا تورکمانەکانو هێنانیان بۆ ناو پرۆسەی بەشداری کردن لە پرۆژەکانی ئاوەدان کردنەوە لە بەڕێوەبردنی کەرکوکدا گرنگی پێبدرێت. بەکەسی بە تواناو شایستەو جێگای متمانە و خاوەن ئەزموون ئەرکەکان بسپێردرێت بۆ سەرخستنی ئەو تاقیکردنەوەیە کە زامن کردنی کوردستانی بوونی کەرکوکە. ناکرێت قایل ببین بەمانەوەی کێشەکە بەم شێوەی ئێستا، ئەو ئەرکە بۆ هەموو دڵسۆزێکی کورد گرنگەو بەشداریو کاریگەری تێدا پێویستە.

تورکمانە ڕۆشنبیرە پێشکەوتوو خوازەکانی کەرکوکو دەوروبەری کە بەداخەوە ژمارەیان لەسەرەتای شۆڕشی تەمموزی ساڵی (١٩٥٨) لە کەرکوکو خورماتووو گەرەکی (تسعین) ئەوەندە نەبوو تا کاریگەرییان هەبێت لەناو جەماوەری تورکمانداو بتوانن دەورو کاریگەری بیری کەمالیەت لە کەرکوکو دەوروبەردا کەم بکەنەوەو گۆشەگیریو ئاڵۆزی پەیوەندی نێوان کوردو تورکمان بەرەو کرانەوەو پێکەوە ژیانی ئاساییو ئاشتیانەی ببەن. خەباتی تورکمان بۆ وەدەست هێنانی مافە ڕەواکانیان بەهۆی دەستێوەردانی دەرەکیو شۆڤینیە عەرەبەکانی ڕۆژئاوای کەرکوکو دەسەڵاتی ناوەندییەوە، هەوڵی خاوەن بیروڕای دۆستایەتیو ئاشتیو پێکەوە ژیانی دیموکراسیانەی نێوانیان، بەرەو ئاقارێکی مەترسیدار دەبرد.

بیری تووندو دەمارگیریو خۆ بەزل زانینی بێ بنەما لەناو خەڵکی تورکمانی کەرکوکدا بڵاو دەکرایەوەو ڕەواجی دەدرایە، لە ئەنجامدا ئەو کەمایەتییە ڕۆشنبیرە پێشکەوتنخوازە تورکمانانە ناچار بوون هەندێکیان بە یەکجاری وڵات بە جێبهێڵنو بەشێکیان گەرانەوەو لەگەڵ زۆرینەی خەڵکەکەدا خۆیان گونجاند. مەسەلەی مەزهەبیش لەناو تورکماندا، تورکمانی سوننیو تورکمانی شیعە کە لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق بە زەقی سەری هەڵداوە تا ئەمڕۆ وەکو پێویست نەیتوانیوە دەورێکی ئیجابی بگێڕێت بەرەو چارەسەر کردنی گرێو ئاڵۆزی ئەو پەیوەندییانەی باس کران لەنێوان کوردو تورکماندا. هەر چەندە دەبێت ئەو ڕاستییە باس بکرێت کە تورکمانی شیعە زیاتر بەر چەوسانەوەو زوڵمی بەعسی کەوتوونو پەیوەندییان لەگەڵ کوردا هەندێ تایبەتمەندی تێدا بەدی دەکرێت ئەگەر ئەو تایبەتمەندیە وەکو ئامرازێکی یاریدەدەری ئیجابی بەباشی بەکار بهێنرێت بەرەو خاو کردنەوەی ئاڵۆزیەکان لەوانەیە لە ماوەی درێژ خایەن سوودی هەبێت.

گرێ کوێرەی ڕووداوەکانی تەمموزی ساڵی (١٩٥٩) یش، لای زۆرینەی ئەو تورکمانانەی لەژێر کاریگەریو ئایدیای تووند ڕەوی تورکیدان، ڕێگرو کێشەیەکی بەرامبەر کرانەوەیان لەگەڵ کوردا هێناوەتە ناو کێشەکەوەو ئاڵۆزتری کردووەو تا ئێستاش نەیانتوانیوە بە عەقڵێکی کراوەو شارستانیانە بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕبنو ڕێگا نەدەن دوژمنانی تورکمانو کورد ئەو کێشەیە وەکو ئامرازێکی هەمیشە لەبار ئامادە بەکار بێننو سوودی لێ وەربگرن بۆ ئاژاوەو گێروگرفت نانەوە.

پاش ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی (١٩٩١) سەرکردایەتی سیاسی کورد وەکو پێویست هاتە پێشەوە هاوکاری پێویستی تورکمانەکانی کرد بۆ وەدەستهێنانی مافەکانیان بە تایبەتی ئەوانەی دژایەتی خۆیان بەرامبەر ڕژێمی بەعسی ئاشکرا کردو داوای کۆمەكو هاوکاریان دەکرد. سیاسەتی کوردی لەسەر ئەو بنەمایە هاوکاری تورکمانی دەکرد بۆ ئەوەی زەمینە خۆش بکات بۆ گەڕانەوەی باوەڕو متمانەو ڕێگا برین لە دوژمنانی هەردوو نەتەوە کە ئەمەش بۆ ئەوەی کێشە بچووکە ئاساییەکانی نێوان دوو نەتەوەی براو دراوسێ گەورە نەکرێن، لە ڕاستیدا ئەوەش سیاسەتێکی حەکیمانەو بوێرانە بوو.

حیزبە تورکمانییەکان هەموو بەبەرەی تورکمانیشەوە کە ڕاستەوخۆ ڕێنمایی لە دەرەوەی سنوورەوە وەردەگرت لە هاوکاری کورد بێ بەش نەکران، بەڵام پاش ئازادی عێراقو گەڕانەوەی تورکمانو کورد بۆ کەرکوکو دەوروبەری (بەرەی تورکمان)ی هەڵوێستی خۆی دژی هەموو ڕاو بۆچوونێکی دۆستانەو برایانەی کورد ئاشکرا کردو بە هیچ جۆرێك ئامادە نەبوو لە هاوپەیمانیەتی لەگەڵ شۆڤینیەتی عەرەب (کە سەر لە نوێ لە گڕێداندا بوو) پاشگەز ببێتەوەو نەیدەشاردەوەو ئێستاش نایشارێتەوە کە ئەوان هەرگیز ڕێگا نادەن کەرکوك بەشێك بێت لە هەرێمی کوردستان، تەنانەت ئەگەر لەم هەرێمەدا هەموو مافەکانی تورکمانیش مسۆگەر بکرێت، ئێستاش بە کوردستان دەڵێن (شمال

العراق)و بە پێشمەرگە دەڵێن ملیشیای کوردی لە کاتێکدا لە چەند بۆنەدا بەرپرسانی کورد ئامادەییان نیشان داوە بۆ گفتوگۆ بەرەو تەبایی و ئاسایی کردنەوەی پەیوەندییەکان ئەوەش لە پێگەی توانا و دەسەڵاتەوە نەك لە بێ هێزییەوە.

بەرەی تورکمانی ستەم و خراپەکانی بەعس بەرامبەر تورکمان هەمووی لەبیر کردووە، کە بۆ ماوەی زیاتر لە (٣٠) ساڵ دانی بوونی تورکماندا وەك نەتەوە نەناوە لە عێراقدا. سەدام بۆ خۆی تانوو تەشەری لە تورکمان دەدا سەبارەت بە پەیوەندییان لەگەڵ تورکیا و دەیگوت (ئەوانەی بێگانە پەرستن با ئێسك و پروسکی مردووەکانیان ببەنەوە بۆ ئەو شوێنەی دڵیان بۆی لێدەدا).

تاریق عەزیزیش لە لێدوانێکیدا لە کاتی سەردانێکی فەرمی بۆ تورکیا دەیگوت ( لە عێراق تەنها کورد و عەرەب هەیە). بێگومان ڕاو هەڵسوکەوتوو پەیوەندییە گومان لێکراوەکانی بەرەی تورکمانی ڕای هەموو تورکمان نییە، ئەوانە هێشتا کەمایەتییەکی دیاری سەر بەدەرەوەی سنوورن و زۆرینەی تورکمان ئەگەر کاری باش بکرێت بتوانن دەوری پێویست و کاریگەر ببینن بۆ گێڕانەوەی متمانە و پەیوەندی دۆستانە و پێکەوە ژیانی ئاسایی نێوانیان.

لەکاتی پرۆسەی شوومی ئەنفالدا شایەد حاڵێکی کوردی خەڵکی خورماتوو بۆی گێڕامەوە کە تورکمانەکانی خورماتوو و کەرکوك بەتایبەتی شیعەکان بۆ ماوەیەك کڕینی گۆشتی بازاڕیان لە خۆیان حەرام کردبوو و پێیان وابوو لەبەر ئەوەی ئەو مەڕو ماڵاتە تاڵان کراون هی کوردن، کڕین و خواردنیان حەرامە و شتومەکی تاڵان کراوی ماڵە کوردیان لە جاشی عەرەب و کورد نەدەکڕی و بەئاشکرا نەفرەتیان لە ئەنجامدەرانی تاوانی ئەنفال دەکرد.

کاتێ هێزەکانی بەعس گەڕانەوە کەرکوك و دەوروبەریان داگیر کردەوە تورکمانی بەشیرو تسعین و تازە و خورماتوو و پردێ وەکو کورد بەر ستەمی هێزە دڕندەکانی بەعس کەوتن و دەیان کەسی بێ تاوانیان لێ شەهید کردن و ماڵ و خانووەکانیان وێرانکرد، خۆ ئێستاش داگیر کردنی خاك و ئاوو موڵکی تورکمانی تازە و بەشیرو دەوروبەری لەلایەن عەرەبەکانی حەویجە و عەرەبە هاوردەکانەوە درێژەی هەیە، بەڵام بەرەی تورکمانی خۆی لە قەرەی ئەو باسانە نادات و تەنها دژایەتی کورد و پێشمەرگە و حکومەتی هەرێمی کوردستانی لا مەبەستە و خەو بە هاتنی لەشکری بیانییەوە دەبینێت. کاتێك لەگەڵ تورکمانێکی سادەی کەرکوکدا گفتوگۆ دەکەم و پرسیاری لێ دەکەم بۆ پەیوەندی دۆستانەی پێشووی نێوان کورد و تورکمان ئاوا ئاڵۆز بووە! بۆ ئێوە پەند وەرناگرن لە جیاوازی دۆستایەتی لەگەڵ کورد یان ئەوانی کەو بۆ هەمیشە چاوەڕوانن هێزی دەرەکی لە باکوورەوە یان باشوور یارمەتیان بدات بە مەرجێ دژی کورد بێت؟. وەڵامی ئەوەیە باشە ئێوە باش بن و دڵنیامان بکەنەوە ترس و دڵەڕاوکێمان مەهێڵن، ئێمە چیمان دەوێ، براکەی جارانین.

دیارە لەناو تورکماندا کەسانی خاوەن بیری شۆڤینیزم و داخ لە دڵ هەیە و ئەوانە بەهیچ پێشکەوتن و گەشە کردنێکی کورد قایل نابن فەرمان و ڕێنمایی دەرەکی جێ بەجێ دەکەن، بەڵام ئەمانە کەمینەن و دەبێ کار لەسەر زۆرینەی تورکمان بکرێت کە خەڵکە سادەکەیانە، ئەوانەی گوێ ڕایەڵی دەرەوە و ناحەزان نین، ئەوانەی بەرژەوەندی ڕاستەقینەیان لە پێکەوە ژیانیاندایە لەگەڵ کورددا. بەدڵنیاییەوە وا دەزانم دەبێ ئێمەی کورد گۆڕانی بنەڕەتی لە دیدو بۆچوون و هەڵسوکەوتمان سەبارەت بە تورکمان و کەرکوك جێ بەجێ بکەین.

تا کاتیش بەدەستەوەیە ئەو گۆڕانە ئەنجام بدرێت سوودی زیاترە، بە پێچەوانە نەیارانی کورد لەناو تورکماندا و دوژمنانی دۆستایەتی و پێکەوە ژیانی ئەو دوو نەتەوە ژمارەیان زیاترو دەسەڵاتیان زۆرتر دەبێت و دەبنە کۆسپ لە ڕێگای گەڕانەوەی کەرکوك بۆ جێگای سروشتی خۆی کە هەرێمی کوردستانە، عەرەبە شۆڤینییەکانیش بۆ بەرژەوەندی خۆیان وەکو هەمیشە تورکمان و کێشەی تورکمان گەورەترو ئاڵۆزتر دەکەن و چۆن قازانجی تێدا بێت ئاوا بەڕاست و چەپدا دژی کورد بەکاریان دێنن.

دەبێ دڵە ڕاوکێ و نەبوونی متمانە و ترسی تورکمان لەلایەن کورد بە وردی بخوێنرێتەوە و هەندێ هەقیان بدرێتێ کەوا بیر بکەنەوە، ئەوەش بەدەر لە هەوڵ و پیلانی دژ بە کورد و تورکمان کە لە دەرەوەی کەرکوکەوە هەوڵی بۆ دەدرێت. تورکمانەکان برایانە دەڵێن و نایشارنەوە کە یادەوەری تاقیکردنەوەیان لەگەڵ ئێمە لە ڕاپەڕین و لە کاتی جێ بەجێ کردنی پرۆسەی ئازادی کەرکوکدا زۆریان بەختیار ناکات، ئەوان دان بەکارە باشەکانی کوردا دەنێن لە یارمەتی و دامەزراندن و جێبەجێکردنی پرۆژەی ئاوەدان کردنەوە لە کەرکوك و خزمەتگوزاری و پێیان باش بوو ئەو کۆمەك و یارمەتییانە وەکو کورد وەکو حکومەتی هەرێم پێشکەش بکرێت نەك وەکو حیزب، چونکە بەلای ئەوانەوە ئەگەر حکومەت یان دەزگا ڕەسمییەکان پێی هەڵسن یەکسانی و عەدالەتی باشتری تێدا ڕەچاو دەکرێت. ئەو دۆستانە مەسەلەی ڕاوو ڕووت و ئازاردانی خەڵکی بێ تاوان و گەڕان بەدوای دەسکەوتی مادی کە دڵنیاشن بە فەرمان و بڕیاری سەرکردایەتی سیاسی کورد جێ بەجێ نەکراوە، بەڵام لەسەر کورد و شۆڕشگێڕان و حیزبەکانی کوردستان کەوتووە، دەبوایە بۆ کارێکی وا گرنگ کە ئازادی کردنی کەرکوکێکی خاوەن تایبەتمەندی و جێگای تەماحی ئەملاو ئەولایە ئەوپەڕی وردەکاری بەکار بهاتایە، نەك لێشاوی کەسانی بەرەڵاو دوور لە ڕەوشتی بەرزی شۆڕشگێڕانە ئازادبن چی دەکەن بیکەن و لە لێپرسینەوە باکیان نەبێت، ئەوانە کردەوەکانیان ناوو ناوبانگی پێشمەرگە و شۆڕشیان لەکەدارکرد و بەڵگەیاندا بەدەست دوژمنانی کورد و تورکمانەوە بۆ ئەوەی ئەو ڕووداوانە لە قەوارەی خۆی گەورەترو سامناکتر پیشان بدەن، زۆرینەی تورکمانیش وەکو لە سەرەتا باسمان کرد بە ئاسانی لە قەناعەتی خۆیان پاشگەز نابنەوە.. ئەو برادەرە تورکمانانە ڕایان وایە ئێستاش کات بەسەر نەچووە، دەبێ بەڕێوەبەرایەتی کورد لە کەرکوك و بە یارمەتی و پشتگیری حکومەتی هەرێم و سەرکردایەتی سیاسی کورد زوو بە خۆیدا بچێتەوە و بەتووندی ڕێگا

بگرێت لە دووبارە بوونەوەی ئەو دیاردە ناشیرینانە، دەست گرتن بەسەر ماڵ و موڵکی خەڵك و زەوت کردنی ئۆتۆمۆبیل و موڵکی دەوڵەت سزاکەی زۆر قورس بێت و بەشێوەیەك چارەسەری ئەو مەسەلانە بکرێت و دووبارە بوونەوەیان مەحاڵ بێت. ئەوان دەڵێن ئێمە پاش ئەوەی عەرەب و بەعس لە کەرکوك هەڵاتن بەهیوای عەدالەت و دەسەڵاتێکی دادپەروەر و دابین کردنی یاسا بووین و ماینەوە، بەداخەوە رووبەرووی کۆمەڵێك هەڵسوکەوتی ناپەسەند بووینەوە کە دەڵێن ئەوانەی ئەنجامیان دەدا نە پێشمەرگەو نە شۆڕشگێڕ بوون، بەڵام لە پەنای ئەواندا هاتن و لە سزاو لێپرسینەوەش دەرباز بوون، گێڕانەوەی متمانەی نێوانمان کارێکی دژوارە، بەڵام قابیلی جێ بەجێ کردنە و دەستپێشخەری لای برا کوردەکانمانەوە دەبێ پەلەی لێ بکرێت. تا ئەمڕۆش خەڵکی لەو بابەتەی ئەو برا تورکمانانە باسیان دەکەن ماون بەشێکیان خۆیان خزاندووەتە ناو حیزب و ئیدارەشەوە، ئەوانە تا ئێستاش لە گرنگی ووردی مەسەلەی کەرکوك نەگەیشتون و هەق بە خۆیان دەدەن بە ئاشکراو لە پەناوە دەست درێژی بکەنە سەر ئازادی و ماڵ و موڵکی خەڵك، ئیتر ئەو خەڵکە تورکمان بێت یان کورد بەلایانەوە گرنگ نییە، لەهەر کوێ بوار هەبێ، یاسا پێشێل دەکەن و بۆ خۆ قەڵەو کردن و چوونە پێشەوە لەسەر حیسابی بەرژەوەندی نەتەوەیی درێغی لە هیچ کارێکی ناپەسەند ناکەن. ئەو جۆرە کەسە و ئەو هەڵسوکەوتە و ئەو دیدو بۆچوونە لای ئەوانە هەیە زیانی گەورەی گەیاندووەتە ئایندەی مەسەلەی کەرکوك و کۆسپیشە لە ڕێگای جێ بە جێ کردنی ئەو بڕگانە لە دەستووری عێراقدا هاتووە، ئەمە جگە لەو کۆسپە گەورانەی دوژمنانی سەرسەختی میللەتەکەمان ڕۆژانە دەیهێننە پێشەوە. زۆر پێویستە و گرنگە بۆ زەمینە خۆش کردن و ئاسانکاری لە جێ بەجێ بوونی ماددەی (١٤٠)ی دەستووردا، سەرەتا کورد بۆ خۆی کەرکوك پاك بکاتەوە لە هەموو ئەوانەی بوون و دەبنە کەرەسەو ئامرازی پشێوی و ناتەبایی و تێکدان و ئەو بێ سەرو بەرییەی باڵی کێشاوە بەسەر کاری ڕێکخراوەیی و ئیداریدا بەپەلە چارەسەر بکرێت و لەڕووی ڕاگەیاندنیشەوە بایەخ بدرێتە باسی قووڵ کردنەوەو برایەتی و دۆستایەتی تورکمان و کوردو ڕێگا نەدرێت کارو کردەوەی شۆڤێنی تورکی و کەناڵەکانی ڕاگەیاندنیان و هەوڵ و کۆششی دوژمنەکانی دیکە کاریگەری هەبێت لەسەر ئەو هەوڵ و کۆششانە.

بزووتنەی ڕزگاری خوازی کورد و حیزبەکانی ناو بەرەی کوردستانی و بەتایبەتی یەکێتی و پارتی، پێش ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١)و لە کاتی خۆ ئامادە کردنی بۆ بەشداری لە ئازادی عێراقدا، هەوڵی جیدی داوە پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ تورکمانەکانی عێراقدا هەبێت و کەناڵی پەیوەندی دروست کردووە بۆ ئەو مەبەستە لەگەڵ تورکمانەکانی خورماتوو و داقوق و کەرکوکدا، تورکمان لەگەڵ هێزی پێشمەرگەو حیزبەکانی سەر گۆڕەپانی خەبات پەیوەندی دۆستانەیان بەرقەرار کردبوو، پێش پرۆسەی ئازادی عێراقیش حیزبە تورکمانەکانی عێراق بەبەرەی تورکمانیشەوە لە هەموو کوردستان بە ئازادی چالاکیان دەنواند و بارەگایان لە زۆربەی شارەکاندا کردەوە. پێش جێ بەجێ کردنی پرۆسەی ئازادی کەرکوك و لەکاتی ئەنجامدانی پرۆسەکەدا هەندێ گۆڕان هاتنە پێش بە شێکیان لە دەرەوەی ویست و ئیرادەی کوردا بوون، ئەوانی کەش لە ئەنجامی نەبوونی نەخشەو پلانی دروست و وورد بوون، دەکرێت بە خاڵ ئەو گۆڕانانە باس بکرێت:

١. ئەو حیزبە تورکمانییانەی کورد هاوکاری دەکردن بەتایبەتیش ئەوانەی لەناو بەرەی تورکمانیدا کۆببونەوە، هەڵوێست و بۆچوونیان بەستبوو بە هەڵوێستی تورکیاوە، کاتێ (دەسەڵاتی عەسکەری) لە تورکیا ئاشکرایان کرد کە ئامادە نین بەشداری هاوپەیمانان بکەن لە پرۆسەی ئازادی عێراقدا (کە بێگومان ئەو هەوڵوێستە زیانی بۆ تورك هەبوو ئێستا لێی پەشیمانن)، حیزبە تورکمانەکانیش (ئەوانەی ناو بەرەی تورکمانی) هەمان هەڵوێستی تورکیایان وەرگرت، ئەوەش بۆ ئەوان و بۆ کوردیش زیانی بەدواوە بوو، هەڵوێستیش لەسەر هەڵەو کورت بینینی بنیات نرا بوو، کاریگەری سەلبی بەجێهێشت لەسەر پەیوەندی کورد و تورکمان لە کەرکوك و دەوروبەریدا.

٢. پاش ئازادی کەرکوك و لە ئەنجامی هاتن و هاوکاری بەرەی تورکمانی و داوای کۆمەك و یارمەتیان لە کەرکوك، دەستێوەردانێکی دیارو بەهێز تورك لە کەرکوکدا هاتە ناوەوە، ئەو دەستێوەردانەش بە بەرنامە جێ بەجێ دەکرا بەمەبەستی تێکدانی ئەمن و ئاسایشی کەرکوك و لە ئاژاوە نانەوە لەناو پێکهاتەکانی ئەم شارەدا، پارەو چەك و توانای ڕاگەیاندنی زۆریش خرابووە بەر دەستی ئەنجامدەرانی ئەو دەستێوەردانە.

٣. هەڵسوکەوتی نابەرپرسانەو ناشۆڕشگێڕانەی هەندێ کەس و گرووپی کە لەسەر کورد دەژمێردرا.

٤. حیزبە تورکمانییەکانی دەرەوەی بەرەی تورکمانی، لەگەڵ ئەوەی هاوکاری دەکران لەلایەن کوردەوە، نەیانتوانی وەکو پێویست دەوری خۆیان ببینن و جەماوەری تورکمان بێنن بەلای خۆیاندا.

٥. دەوری شۆڤینی عەرەبی و پاشماوەکانی سەدام و ئەو عەرەبانەی پاش ماوەیەکی کورت کە دڵنیا بوون کورد تۆڵەیان لێ ناکاتەوەو گەڕانەوە، ڕۆڵی دیاریان هەبوو لە قووڵ کردنەوەی کێشەکان و بەکارهێنانیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان.

ئەو هۆیانەی باس کران و هۆی لاوەکی دیکەش دەوریان هەبوو لە مانەوەی پەیوەندییە ساردەکانی نێوان تورکمان و کورد بە شێوەیەکی هەڵواسراو و نادیار، تەم و مژاوی و هەندێ جار ئاڵۆزیش لە پاش ئازادی کەرکوك تا ئێستاش، ئەو گیروگرفتانە چارەسەری بنەڕەتی بۆ نەدۆزراوەتەوە، لێرەو لەوێ هەوڵی پچڕ پچڕو بێ بەرنامە دراوە، بەڵام وەکو پرۆژەیەك کاری گرنگی ئەوتۆ نەکراوە کە ئەنجامی دیارو سوود بەخشی هەبێت.

بۆ ئاسایی بوونەوەی پەیوەندی تورکمان و کورد لە کەرکوکداو ڕەواندنەوەی ئەو هەموو تەم و مژەی ئەو پەیوەندییانەی تێدایە، گرنگە وەکو سەرەتاو دەسپێك ئەم

خاڵانەی خوارەوە کاریان لەسەر بکرێت وەکو سەرەتای بەرنامەیەك کە لە دوایدا بە پێشنیارو ڕاو بۆچوونی ئەکادیمیانە دەوڵەمەندو فراوان تر بکرێت:

١. حیزبە کوردستانییەکانو بە تایبەتی پارتیو یەکێتی دەربارەی هەموو بابەتێك پەیوەندی بە کەرکوکەوە هەبێت سیاسەتێکی یەکگرتوو و ڕوونیان هەبێت لە کەرکوکدا پێویستە کوردایەتی ئەولەویەتی بدرێتیو بڕیاری یەکلاکەرەوەو ڕاستگۆیانە بدرێت بە جۆرێك کە ملمڵانێی حیزبی ئەگەر لە هەموو شوێنێك لە کوردستاندا ڕێگای بدرێتی، دەبێ لە کەرکوك قەدەغەو تەحریم بکرێت.

٢. ئیدارەو دەسەڵاتی مەدەنیو سەربازیو پۆلیسی کە زۆربەی بەدەست کوردەوەیە بە تەواوی پاك بکرێتەوە لەو کەسانەی بۆ جێبەجێ کردنی سیاسەتی چارەسەری بنچینەیی کەرکوك بە کەڵك نایەن.

٣. ڕێگا گرتنو سزادانی هەموو کەسێكو تاقم و گرووپێك، لەگەڵ تەبایيو ئارامیو ئاسایشی دانیشتووانی کەرکوکدا نین، جا ئەو کەسانە سەر بە هەر حیزبو دەسەڵاتێك بن کە دەرکەوت بە بەڵگەوە کاری پێچەوانەی بەرژەوەندی پێکەوە ژیان دەکەن، لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکرێتو سزا بدرێنو لە پۆستو بەرپرسیاریەتیو دەسەڵات دەربکرێن.

٤. کەسانی دەست پاك، خاوەن ئەزموونو شارەزاو بە توانا لە شوێنی خەڵکی گەندەڵو بێ کەڵكو ناشارەزا دابنرێن.

٥. کابینەی پێنجەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان کە دوو وەزیری تورکمانی تێدایەو متمانەی پەرلەمانی کوردستانیان دراوەتێ پێویستە ئەو وەزیرانە کاریگەرییان هەبێ لە چارەسەر کردنی کێشەی کەرکوکداو بەشدار بکرێن، دەسەڵاتو ڕێگایان پێبدرێتو هاوکاریان بکرێت بچنە ناو جەماوەری تورکمانی کەرکوکەوەو شان بە شانی حیزبە کوردستانییەکانو پەرلەمانو حکومەتی هەرێم دەوری خۆیان ببینن، تا ئێستا ئەو بەرێزانە تەنها کاری ئیداری دەکەن وەکو فەرمانبەرێکی پلە تایبەتی حکومەتی هەرێم، لە کاتێکدا تورکمان بوونی ئەو وەزیرانە ئەرکو تایبەتمەندی خۆی هەیە، بە پاڵپشتی حکومەتی هەرێمی کوردستان پێویستە ئەو وەزیرانە بخرێنە گەڕو دەوریان بدرێتێ بە مەرجێ هەموو توانایەکی مەعنەویو ماددیان لەبەردەست بێتو ڕووبەڕوو بکرێنەوە لەگەڵ ئەرکە سەختو دژوارەکانیان.

لەم بارەیەوە لە هەندێ دۆستی تورکمانم بیستووە، کاتێ باسی ئەوەم بۆ کردوون کە ئەوان دوو وەزیریان هەیە، دەڵێن: ئەوانە وەزیری خۆیانن، باشە بۆ نایەن لەگەڵ خەڵکی تورکمانو گیروگرفتی تورکمان تێکەڵاو بنو ئامرازێکی کاریگەر بن لەنێوان حکومەتی هەرێمو تورکمانی کەرکوك، ئەوان تەنها کوردسییەکانیان لە ئەنجومەنی وەزیران پڕ کردۆتەوەو کاریان بە ئێمەوە نییە، پێویستە وەزیرێك بۆ کارو ئیدارەی پەیوەندیدار بە تورکمانو حکومەتی هەرێمەوە.

٦. پێویستە گفتوگۆیەکی هێمنانە لەم کاتەدا دەست پێ بکرێت لەنێوان دەسەڵاتدارو ڕۆشنبیرانی هەرێمی کوردستانو تورکمانەکان بەوانەشەوە کە پرۆژەی گەڕانەوەی کەرکوك بۆ هەرێمی کوردستان ڕەتدەکەنەوە، بۆ لەیەك حاڵی بوونو هەوڵدان بە گەیشتن بە خاڵی هاوبەشو لە نزیکەوە باسی هەموو گیروگرفتەکان بکرێت، دوور لە کاریگەری دەورووبەر.

٧. ڕاگەیاندنی کوردستانی بە حیزبو حکومەتەوە، بایەخی زۆر جیدی بدا بە کێشەی تورکمانو داخوازییانو لە نزیکەوە دیدارو گفتوگۆ لەگەڵ خەڵكو حیزبو خاوەن بیروڕا جیاوازەکانیان ئەنجام بدات، هەل برەخسێنێ بۆ بەشداریان لە کۆڕو کۆبوونەوەو دیداریان بۆ ساز بکات بۆ دەربڕینی ڕاکانیانو خەڵکیش ئازاد بن دەربارەی کێشەی کەرکوك گفتوگۆ بکات.

ڕاگەیاندنی کوردی دەتوانێ دەوری ئیجابی ببینێ لە نزیك خستنەوەی ڕا جیاوازەکانو زەمینە ساز بکات بۆ ئەوەی ئەوانەی نا تەبان لە ڕێگای دیدارو گفتوگۆ ڕاستەوخۆ باشتر یەکتر بناسنو پێکەوە هەوڵی چارەسەر کردنی کێشەکانیان بدەن.

٨. ئەو تورکمانانەی لەبەر هۆی جیاواز کۆچیان بۆ دەرەوەی کوردستان کردووە، دەکرێت حکومەتی هەرێمی پەیوەندییان لەگەڵ بکاتو ئەوانەی توانای خزمەتیان هەیەو خاوەن بەهرەن سوودیان لێ وەرگرێت لە پرۆسەی گەشە پێکردنی کوردستاندا.

*** کۆتایی:**

چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوكو ناوچەکانی ململانێ کە بریتین لە کەرکوكو خانەقینو مەخمورو شەنگار، بەو شێوەی خەونی پێوە دەبینینو بڕوامان پێیەتو بەرەوای دەزانین، جگە لەوەی ئایندەی نەوەکانی دوارۆژمان مسۆگەر دەکات، تاقیکردنەوەیەکی مێژوویی گرنگیشە، بۆ سەرکەوتن لەم تاقیکردنەوەیەدا پێویستە هەموو توانایەکمان وەکو نەتەوە وەکو خەڵکی کوردستان ژیرانە بخەینە گەڕ.

کاتی ئەوە هاتووە بە ڕاشکاویو بێ شاردنەوەی ڕاستییەکان لەگەڵ پێکهاتەکانی پەیوەندیداری کێشەکەوەو لە پێش هەموویانەوە برا تورکمانەکان، کە لە هەموو لایەکەوە هەوڵ دەدرێت بکرێتە سووتەمەنیو باجی قورسیان پێبدرێت، لەگەڵ تورکمانو ئەوانی دیکە گفتوگۆیەکی هێمنانە دەست پێ بکرێتو بە کردەوەش بۆیان بسەلمێنین گەڕانەوەی کەرکوك بۆ جێگای سروشتی خۆی کە هەرێمی کوردستانە زیاتر بۆ ئەوان نەهامەتی بەدواوە نابێتو تورکمان پاش جێبەجێ بوونی ئەو پرۆسەیە دەبنە پێکهاتەو هێزی دووەمو نەتەوەی دووەم لە هەرێمی کوردستانداو دوای کورد پشکی دووەمیان بەردەکەوێت لە هەموو دامو دەزگاکان ئەم هەرێمەدا لە پەرلەمان، لە حکومەت، لە ئیدارەدا.

ئەوەش دەستکەوتێکی مەزنە کە هەرگیز نە لە ڕابردوو نە لە ئێستاو نە لە داهاتووش لە ژێر سێبەری دەسەڵاتی ڕەگەز پەرستانەی عەرەبیدا وەدەستی ناهێننو هەمیشە وەکو کەمایەتییەکی بچووکی بێ دەسەڵات لە دەوڵەتی عێراقدا

تەماشا کراون و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کراوە.

بەدەر لە بیرکردنەوەی توندی رەگەز پەرستانەو سۆزو خەونی سوود بەخش برا تورکمانەکان بەراووردێکی ژیرانە بکەن لە ژیان و ئاییندەو بەرژەوەندیان وەکو نەتەوەی دووەم لە کوردستانێکی ئارام و دیموکرات، لەگەڵ ژیانیان لە ناو عێراقێکی پڕ لە کێشەو ململانێی نەتەوەیی و مەزهەبی و عەشایەری و کۆمەڵایەتی وەکو کەمایەتییەکی بچووك و بێ دەسەڵات کە بە خۆیان لە ماوەی (٤٠) ساڵی رابردوو تا ئەمڕۆ تێیدا دەژین و باجی قورسی دەدەن.

بە نەمانی دیکتاتۆریەت و تێکشکانی نەخشەکانی بەعس بۆ بە عەرەبکردنی کەرکوك، کێشەکە پێی ناوەتە قۆناغێکی نوێی جیاواز لە قۆناغەکانی پێش نەمانی دەسەڵاتی دیکتاتۆری. مامەڵە کردنی کوردیش لەگەڵ بابەتە ئاڵۆزەکانی ئەم قۆناغەدا جیاوازە لە هەڵسوکەوت لەگەڵ قۆناغەکانی پێشوو.

هەموو لایەك بە حیزب و دەسەڵات و رۆشنبیران و خەمخۆرانی دڵسۆزی گەلەکەمانەوە پێویستە راشکاوانەو ئازایانە دان بە راستییەکدا بنێین کە ئەویش ئەوەیە لە ماوەی رابردوو لە رووخانی بەعسەوە تا ئەمڕۆ، بەرنامەکانمان، هەوڵەکانیان، نەخشەو پلانەکانمان (کە گومان دەکەم نەخشەو پلانی دروستمان بووبێت) هەموویان وەکو پێویست نەبوون و سەرئەنجام سەرکەوتووش نەبوون، پڕ بوون لە هەڵەو پەلەکردن و کەم و کوڕی، جێگای خۆیەتی بێ دوودڵی و دەست بە جێ بەو کارو بەرنامانەدا پیاچوونەوە بکرێت و رێگای دووبارە بوونەوەیان و هەڵەکانیش بە یەکجاری بگیرێت.

نەیارانی ئاشتی و دیموکراسیەت و پێکەوەژیان و دوژمنە دێرینەکانی گەلەکەمان لەگەڵ زەماندا پێشبرکێ دەکەن و هەوڵەکنیان چڕ دەکەنەوە بۆ زیاتر ئاڵۆز کردنی کێشەکە، چونکە سوور دەزانن گەڕانەوەی کەرکوك و ناوچەکانی ململانێ بۆ هەرێمی کوردستانی تێکشکانە بۆ نەخشەکانیان، تا بتوانن رێگا نادەن پرۆسەی کوردستانی بوونی ئەو جێگایانە جێبەجێ بکرێت و دەست بۆ هەموو ئامرازو کارێك دەبەن. لەم هاوکێشە ئاڵۆزەدا کات زۆر گرنگە، نزیکەی ساڵێك بوار ماوە تێیدا برگەی (١٤٠) جێبەجێ بکرێت.

هەنگاوەکانیش تا ئێستا وەکو پێویست نییە بۆ جێبەجێ کردنی ئەو برگەیە، زەمینە خۆش کردن و ئامادەکاری بۆ ئەنجامدانی خاڵەکانی ئەو مادەیە هەوڵ و ماندووبون و کاتی گەرەکە.

دەکرێت و پێویستە هەوڵ بدرێت سوود لەو کاتەی بەدەستەوەیە وەربگیرێت، لە پێشبرکێی ئێمەو نەیارەکانماندا پێشکەوین، هەل و مەرجی ئێستای کوردستان و عێراق و هاوپەیمانیەتی کورد لەگەڵ دۆستەکانی لە ناو عێراق و دەرەوەی بە باشی بەکار بهێنرێت و تواناکانی خۆمانیش بخەینە سەرو هەموو رێگایەکی گونجاو بەکار بهێنرێت بۆ سەرخستنی پرۆژەیەکی گرنگ، کە گەڕانەوەی کەرکوکە بۆ هەرێمی کوردستان.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**


١. كمال عبد الواحد، (الكرد والتركمان بين الصراع والمصير المشترك)، الصفحة (٥).

٢ . بڵاوکراوەی (رووناکی کەرکوك)، ژمارە (٢٧)، ساڵی دووەم، خالد دلێر.

٣. گۆڤاری (رێبازی خوێندکاران)، ژمارە (٣)، ساڵی ١٩٩٩، لاپەرە (٦٧ – ٧٥)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:
(بیرەوەرییەکانی تەها تۆفیق لەناو یەکێتی قوتابیانی کوردستان).

٤. گۆڤاری (پەیڤین)، ژمارە (٩)، تەمموزی ساڵی (٢٠٠٠)، لاپەرە (٢٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(لە ئامێزی کەرکوکدا)، نووسینی: کاکەمەم بۆتانی.

٥. مەسعود بارزانی، (بارزانی و بزووتنەوەی رزگاری خوازی کورد)، لاپەرە (٨٨).

٦. د. نوری تالەبانی، (سیاسەتی بە عەرەب کردنی کەرکوك)، لاپەرە (١٠٨).

٧. لەتیف فاتیح فەرەج، (رۆڵی تێکدەرانەی نازم تەبەقچەلی لە کەرکوك)، لاپەرە (٨٠).

٨. گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ژمارە (٤)، ١٩٩٩، لاپەرە (٥٤)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(حەویجە خاکی زەوت کراوی داوێنی حەمرین)، نووسینی: ئەحمەد رەحیم.

٩. شێخ رەئوف خانەقا، (یاداشت و شیعر).

١٠. د. نوري طالباني، (كركوك ومحاولات تغير الواقع)، لندن، ١٩٩٥.

١١. سەرۆك وەزیران بوو لە سەردەمی مەلیك غازی ساڵی ١٩٣٧، بڕوانە:
– گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ژمارە (١)، ئەیلولی ساڵی ١٩٩٨، لاپەرە (١٠– ١٩).

١٢. مجلة (كركوك)، العدد (٢)، الصفحة (١٨٧)، موضوع بعنوان:
(السياسة الحكومية بحق الكرد في كركوك خلال العهد الملكي)، كتابة: د. جبار قادر.

١٣. گۆڤاری (سەنتەری برایەتی)، ژمارە (٢٠)، لاپەرە (٢٢٧– ٢٢٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(کێشەی بە عەرەب کردنی کەرکوك)، د. رەفیق شوانی.

١٤. (حەویجە خاکی زەوت کراوی داوێنی حەمرین)، ئەحمەد رەحیم.

١٥. بڕوانە:
– گۆڤاری (کەرکوك)، ژمارە (١)، هاوینی ساڵی (١٩٩٩)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(مێژووی دۆزینەوەو دەرهێنانی نەوت لە کەرکوك)،

نووسینی: د. ئازاد نەقشبەندی.
- گۆڤاری (کەرکوك)، ژمارە (٢٠)، هاوینی ساڵی (٢٠٠١)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(کێشەی بە عەرەبکردنی کەرکوك لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ)، نووسینی: ڕەفیق شوانی.
١٦. گۆڤاری (سەنتەری برایەتی)، ژمارە (٢٠)، هاوینی ساڵی (٢٠٠١)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(کاریگەری نەوتی کەرکوك لەسەر ڕاگوێزانی کوردو بەعەرەب کردنی).
١٧. گۆڤاری (کەرکوك)، ژمارە (٢٠)، هاوینی ساڵی (٢٠٠١)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(کێشەی بەعەرەبکردنی کەرکوك لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ)، ڕەفیق شوانی.
١٨. (التأریخ السیاسي لترکمان العراق)، (دار الساقي)، بەیروت، لوبنان، ١٩٩٩.
١٩. گۆڤاری (سەنتەری برایەتی)، ژمارە (٢٠)، هاوینی ساڵی (٢٠٠١)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(شاری کەرکوك لە ڕووی مێژوویی و ئەنتۆگرافی و هەوڵی بەعەربکردنی)، جەرجیس فەتحوڵلا.
٢٠. (العراق الشمالي)، محەمەد هادی دەفتەری، بەشی یەکەم، چاپخانەی (شفیق)، بەغدا، ١٩٥٥.
٢١. محەمەد شاکەلی، (گەرمیان.. رابوردوو و ئەمڕۆی)، چاپی یەکەم، چاپخانەی (سلێمانی)، لاپەرە (٢٣).
٢٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، (ژمارە ٢).
٢٣. محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، (مدن کردیة.. تأریخها، رجالها، علمائها، ادبائها)، چاپی یەکەم، چاپخانەی (هەواڵ)، سلێمانی، ١٩٩٩.
٢٤. د. نوری تاڵەبانی، (سیاسەتی بەعەرەب کردنی کەرکوك).
٢٥. جەلال تاڵەبانی، (لە یادی ڕزگاری کردنی کەرکوك)، نامیلکە.
٢٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٢٧. گۆڤاری (سەنتەری برایەتی)، ژمارە (٢٠)، ٢٠٠١، لاپەرە (٢٢٧ - ٢٢٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(کێشەی بە عەرەبکردنی کەرکوك)، د. ڕەفیق شوانی.
٢٨. گۆڤاری (پەیامی ئازادی)، ٢٠٠١، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:
(لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی لە ڕووی سیاسی و فیکرییەوە)، نووسینی: ئیسماعیل ڕەسول.
٢٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٣٠. عەزیز قادر ئەلسومانچی، (التأریخ السیاسي لترکمان العراق)، (دار الساقي) بەیروت، ١٩٩٩.
٣١. کەماڵ عەبدولواحید، (الکرد والترکمان بین الصراع والمصیر المشترك)، ئەنتەرنێت.

## * پرۆژەی یاسای پاسەوانی نیشتمانیو کارگەرییەکانی لەسەر کەرکوك:

لە کاتی هاتنە سەر کاری (حەیدەر عەبادی) بۆ پۆستی سەرۆکی وەزیران لە یەکێك لە ڕەشنووسەکانی پرۆگرامی حکومەتەکەیدا باس لە دامەزراندنی (مسودة مشروع قانون الحرس الوطني) هاتووە کە گوایە هێزێکی سەربازییەو سەر بە بەرگری عێراقەو لە چوارچێوەی عێراقدایە بە تایبەتیش لە چوارچێوەی هەر پارێزگایەك لە ئاقاری هەموو ئەو قەزاو ناحیانەی کە سەر بەو پارێزگایەیە، هەروەها لە ڕەشنووسەکەیدا ئاماژەی بەوە کردبوو کە گوایە بۆ هاوسەنگ کردن یان هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەم پاسەوانە نیشتمانییە لە پێکهاتەو نەتەوەکانی ئەو پارێزگایە دەبێت بە بێ جیاوازی.

هەروەها لە ڕەشنووسەکەدا ئاماژە کردووە بەوەی کە ئەندامانی ئەم پاسەوانانە پێکهاتوونە لە کەسانی کۆن لە سوپای عێراقو لە سەربازو ئەفسەرە پلەدارەکان، هەروەها خۆلێخۆش بوون لە هەموو ئەو یاساو پایەندیانەی کە دەیانگرێتەوە، هەروەها قەدەغەی لکاندنی میلیشیاو پێکهاتە سەربازییەکان دەکات کە لە هێزی فەرمیدا نین بلکێندرێن بە سوپای نیشتمانییەوە.

ئەوەی جێگەی سەرنجە لەم ڕەشنووسی یاسایەدا باس لەوە دەکات کە ئەندامانو پێکهاتەکەی لە خەڵکی پارێزگاکە پێك دێت بە بێ جیاوازیو بە شێوەی ڕێژەی هەر نەتەوەیەك لەو پارێزگایە بە پلەی زیادو کەم بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە تا بگونجێت لەگەڵ خواستی دانیشتووانن بەڵام کاتێك هاتووەتە سەر پارێزگای کەرکوك تایبەتمەندی خۆی داوەتێ و ڕچاوی زۆریو کەمی پێکهاتەو نەتەوەکانی شارەکەی نەکردووە، بەڵکو بە شێوەی لە (٣٢٪)ی داناوە بۆ هەر نەتەوەیەك بەم شێوەیە: (٣٢٪) بۆ عەرەب، (٣٢٪) بۆ کورد لەنێوانیاندا هێزی پێشمەرگە، (٣٢٪) بۆ تورکمان، (٤٪) بۆ مەسیحییەکان، بەڵام کە بەراوردی کردووە لەگەڵ بەغدا ڕێژەی (٥٠٪)ی داناوە بۆ هەموو پێکهاتەکانی عەرەب بە یەکسانی.

ئەمەی لەم ڕەشنووسەدا بەرچاو دەکەوێت جۆرێکە لەو پرۆژە گەورەیەی کە عەرەب هەوڵی بۆ دەدا لە عێراقدا لەپێناو جێبەجێ کردنی هەمان سیاسەتەکانی ڕژێمی بەعس بەڵام بە شێوازو بنەمایەکی تازە لەسەر بنەڕەتی, خواستەکانی عەرەب بۆ داگیرکردنی ناوچەکە بە تایبەتی کوردستان.

## * ئۆپراسیۆنەکانی دیجلە لە کەرکوك:

سمکۆ بەهرۆز

هەر لە ساڵی (١٩٢٧)ەوە کە نەوت لەم شارەدا دەرهێندرا، کەرکوك کەوتە سەر چەقی ململانێیەکی گەورەی سیاسی ناوخۆی عێراق و دەرەوەی عێراق.

لە پێش ئەم مێژووەشدا سیخورو گەریدەکانی بەریتانیا و رووسیا و ئەمریکا و ئەڵمانیا ناوە ناوە سەریان لەم دەڤەرە داوەو یادەوەرییەکانیان دوورو نزیك باسی ئاگرو نەوت و بڵێسەی باباگورگوریان کردووەو سەرنج و تێبینییەکانی خۆیان گەیاندۆتە دەوڵەتی باڵا دەستەکانی خۆیان و تێبینییەکانیان بووەتە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ تاوتوێکردنی سیاسەتەکانیان لەسەر مێژی رێککەوتن لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا، هەر ئەم یاداشت و بیرەوەرییانە بوو وای کرد کە گۆرانکاری لە برگەو بابەتەکانی سیڤەرو لۆزاندابێت.

هەر لە دوای لکاندنەوەی ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە چەقی کێشەکان لە ناوچەی کەرکوکەوە سەری هەڵداو هەڵقوڵاوی نەوت بەو رێژە زۆرە بوو بە بەرچاوی کەرکوك لەلایەن حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق و دەوڵەتەکانی دەوروبەری بۆ تێبرین لە نەوت و داهاتەکەی کە لە دواییدا تورکیای ئێستا هەستی بە لە دەستدانی ئەو بەشە گرنگە کرد.

حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق کە بەرچاوترینیان حکومەتی بەعس بوو هەموو رێگەیەکیان بەکارهێنا لەپێناو کۆنترۆڵکردنی ئەم ناوچەیە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ئاسان بتوانن سوود لە سەرچاوەکانی نەوت وەرگرن، بۆیە بەکارهێنانی سیاسەتی تەعریب و نیشتەجێ کردن و هێنانی عەرەب بۆ ناوچەکانی حەویجەو دەوروبەری کەرکوك خۆی دەبینێتەوە لەو سیاسەتە ستراتیجییەی کە نەخشەی بۆ دارێژرابوو چ لەلایەن حکومەتی ناوخۆییەوە یان لەلایەن بەریتانیا و ئەمریکا بۆ جێبەجێکردنی پشکی خۆیان لە نەوتی کەرکوك، هەر ئەمەش وایکرد کوردیان هێشتەوە لە چوارچێوەی عێراق و حکومەتەکەی شێخ مەحمودیان لە ناودا چونکە مەبەستێکی درێژخایەنیان هەبوو لە بەرجەستەکردنی ئەو سیاسەتەی کەلە دوارۆژی نەوت لە ناوچەکەدا دەیانبینی، کە ئەو کاتە تەنها کەرکوك بەرچاوی کێشەکە بوو، بەڵام ئێستا بەشێکی گەورەی کوردستان کەوتۆتە بەرچاوی حکومەتی ئێستای بەغداو حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی ئەوروپا بە تایبەتی ئەمەریکا.

هەر لە ساڵی (١٩٦١)ەوە کێشەی کەرکوك بووەتە کێشەیەکی گەورەو هەموو دانووسانەکانی شۆرشی کورد لەگەڵ بەغداد لەسەر کێشەی کەرکوك هەرەسی هێناوەو حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق هەوڵیداوە سوود لەکات ببینێت بۆ تەفرەدانی شۆرشی کورد، کوردیش هیچ کاتێك نکۆڵی لە رەوایی کەرکوك وەکو شارێکی کوردستانیی نەکردۆتەوەو هیچ کاتێك سازشی لەسەر نەکردووە.

بەعس بەبە هێزترین حکومەت دادەنرێت لە عێراقدا کە ستراتیجێکی درێژخایەنی هەبوو لە بەرجەستەکردنی مەلەفی کەرکوك وەکو مەلەفێکی گرنگی عێراق و لەبەرچاوگرتنی هەموو رێگاکان بۆ تەعریبکردن و شێواندنی دیمۆگرافی ئەم شارە.

لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقیشەوە تاوەکو ئێستاکە کە ماوەی دە ساڵێك دەبێت هیچ گۆرانکارییەك لە سیاسەتی حکومەتدا نەهاتووەو هەر بەو عەقڵییەتەی جارانەوە بیر لەکێشەی کەرکوك دەکەنەوە. لە رۆژی کشانەوەی ئەمریکاوە لە عێراق ئەوەندەی دیکە کێشەکان ئاڵۆزبوونەتەوەو دەیەوێت چارەسەرکردنی کێشەی کوردستان و کەرکوك هەر بە عەقڵییەتی چەك و سوپا چارەسەر بکات و بەمەش کێشەکانی نێوان کوردو بەغدا ئاڵۆزتردەبێت و لەوانەیە لە کۆتایدا عێراق بەرەو جەنگێکی خوێناوی ببات و کاتەکەشی کەس نازانی بەرەو کوێ دەچێت دووبارە عێراق بچێتەوە گۆرەپانی ململانێکانی ئەقلیمی و ئەو گۆرانکارییەی ئێستا لە گۆرەپانی سوریادا هەیە عێراق و بەشێك لەناوچەکە کەوتۆتە سەر راستەرێی گۆرانکارییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراست کە عێراق و سوریا و ئێران و لوبنان و تورکیا و ئیسرائیلیشی تێوەبگلێت.

ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لە جموجوڵی عێراقدا چ لەناوخۆو چ لە دەرەوەی لەگەڵ دەوڵەتەکانی دەوروبەری ئەوە یەکلا دەبێتەوە کە خەریکە عێراق دەکەوێتە سەر ئەو ئاراستەی کە چارەسەری دانووساندن بگۆرێتەوە بە هێزو سوپا. لەماوەی پرۆسەی ئازادی عێراقەوە گەلێك وەرەقەی سیاسی بۆ کەرکوك پێشنیار کراوە لە هەرێمێکی سەربەخۆ، مادەی (١٤٠)، قەرەبووکردنەوەی گەراوەکان و هاوردەکان، ململانێی لایەنە حیزبییەکانی عێراق لە کەرکوك، پێداگری عەرەب لەگەڵ سیاسەتی مەرکەزدا، رێنماییەکانی بەرەی تورکمانی لەگەڵ حکومەتی تورکیا، ململانێی حیزبە کوردییەکان لە کەرکوك.. ئەمانە هەمووی ئەوەندەی تر مەلەفی کەرکوکیان ئاڵۆزتر کردووەو ئەو پێشنیارەی کە بەرێز مام جەلال وەکو سەرۆکی عێراق دایرشتبوو بۆ دووبارە دارشتنەوەی یەکە ئیداری و بەرێوەبەرییەکانی عێراقدا لە ململانێ سیاسییەکانی عێرقدا هەرەسی هێنا.

یەکێ لەو رێگاو شوێنانەی کە حکومەتی عێراق بەکاری هێنا ئەویش دامەزراندنی چالاکی ئۆپراسیۆنەکانی دیجلەیە بوو لە ناوچەکانی کەرکوك و دیالەو موسڵ و سەلاحەددین، کە هێڵێکی کەوانەیی بە دەوری بەغداو هێڵە سنوورییەکانی لەگەڵ تورکیا و سوریادا هاوگونجاندبوو.

لــێرەوە ئـۆپـراسـیـۆنـەکـانـی دیجـلـە لـە سـەرەتـای دروستبوونییەوە وەکو هێزێکی یارمەتیدەری سوپای عێراق دامەزراوەو لە سەرەتادا دەسەڵاتەکانی سنووردار بووە لە رووکەشدا بەڵام لە ناوەرۆکدا دەسەڵاتێکی فراوانی هەیە کە بەو شێوەیە لە دەستووریشدا نەهاتووە وەکو ئەوەی باسی لێوەدەکرێت چونکە ئەمە جۆرێکە لە تاکرەویی سیاسەتی ئۆپـراسـیـۆکـان دیجـلـە و هـاوپـەیـوەسـتـکـردنـی بـە سـەرۆك وەزیرانی عێراق (نوری مالیکی).

پێکهاتەی فەرماندەیی ئۆپراسیۆنەکانی دیجلە لەو ڕۆژانەدا گەرمترین بابەتی نێو میدیای کوردیو باسو خواسی هەموو ناکۆکییە کۆنەکانی نێوان بەغداو هەرێمی کوردستانی بە ژێرەوە کردووە. (عەبدولئەمیر زەیدی) فەرماندەی ئۆپراسیۆنەکانی دیجلە یەکێکە لە فەرماندەکانی سوپای عێراقو گەلێك بەوە تاوانباری دەکەن کە دەستی هەبووە لە ئەنفالو هەندێکیش دەڵێن دەستێکی باڵای هەبووە لە هێرشکردنی (٣١)ی ئاب بۆ سەر کوردستان.

هەروەها جێگری فەرماندەی هێزەکانی ئۆپراسیۆن تورکمانێکی سەر بە بەرەی تورکمانییە بەناوی (عەمید روکن موئەییەد نورەددین) بەڵام وەکو سیاسەتی حیزبەکە لەگەڵ دامەزراندنی ئەو ئۆپراسیۆنەی دیجلە دانین.

پێکهاتەی ئۆپراسیۆنەکانی دیجلە بریتییە لە:

١. سێ فیرقەی سەربازی (٣٦) هەزار سەربازی هەیە.

٢. هەر فیرقەیەکی (٣٨) تانکی جۆری (٧٢ T)ی هەیە.

٣. گوللەی هەر تانکێك (٣٨) کم دەڕوات.

٤. هەر لیوایەك (٢٨) تۆپی (١٥٥) ملمو (١٢٢) ملم ی هەیە.

٥. تۆپی (١٥٥) ملم لە عێراق بە حەشوەی ئێرانی پڕ دەکرێت (٢٢)کم دەڕوات، تۆپی (١٢٢) ملم - کەشی (١٨) کم دەڕوات.

هەروەها دەنگۆی ئەوە بڵاوە کە لەلایەن ڕێکخراوی کوردۆسایدەوە کە ڕێکخراوێکی تایبەتە بە جینۆسایدناندنی بە کۆمەڵ کوشتنی کورد لە بەیاننامەیەکدا ڕایگەیاندووە کە فەرماندەی هێزەکانی ئۆپراسیۆنەکانی دیجلە لە دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق داواکراوە، چونکە بەشداری لە ئەنفالکردنی کورددا کردووە.

ئەوەی جێگەی سەرنجە لە جموجوڵەکانی ئۆپراسیۆنەکانی دیجلە باڵ بەسەر ناوچەیەکی فراوانی کەرکوكو موسڵو دیالەو سەلاحەددینو ناوچە دابڕێندراوەکانی کوردستاندا گرتو لە هەوڵی کۆکردنەوەی زانیاریو دروستی ئەمنیو سیخوڕیدا بووە بۆ ئەوەی لە ئانو ساتی دیاریکراودا کارو چالاکی خۆی جێبەجێ بکات. ئەوەی جێگەی سەرنجە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ چالاکییەکانی زیاد دەکاتو هەوڵەکانی چڕ دەکاتەوە بۆ درێژەدان بە سیاسەتێکی دووڕو درێژی حکومەتی عێراق کە خۆی دەبینێتەوە لە بەکارهێنانی هێزو چەك لەپای دانووستانو چارەسەرکردنی کێشەکان، بۆیە دەتوانین برگە بە برگەی چالاکییەکانی ئۆپراسیۆنەکانی دیجلە بخەینەڕوو کە خۆی دەبینێتەوە لەم خاڵانەی خوارەوە:

١. لە هەوڵی دروستکردنی ڕایەڵەکی ڕاگەیاندن بووە بەشێوەیەکی ئەوتۆ کە هەوڵەکانیان چڕ بکەونەوە بۆ هەموو لایەك بەوەی کە ئەم ئۆپراسۆنە بەشێکە لە وەزارەتی بەرگری عێراقو ئەرکەکەی بۆ کۆنترۆڵکردنی تیرۆرو تیرۆریستانە لە پای ئەوەی سیاسەتێکی تری درێژخایەنیان هەیە بۆ جێبەجێکردنی مەرامەکانیان، ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە لە یەکەم هەنگاویاندا کار بە ئەو شێوەیە دەکەن کە هاو گونجاوە لەگەڵ ڕاکێشانی ئاوەزی خەڵکی ناوچەکە کە بەشێکی گەورەیان عەرەبە بۆیە ڕاگەیاندنەکانیان بۆ سەرنجدانە لە ڕایەڵەکردنی ئەو عەقڵییەتە شۆڤێنییەی جارانی عەرەب کە سیاسەتی بەعسی لەسەر دارێژراوە.

٢. ئۆپراسیۆنەکانی دیجلە دەزگایەکی سیخوڕیو هەواڵگری گەورەیان هەبووە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر هەموو حیزبو هێزو لایەنو ڕێکخراوە کوردییەکان لە ناوچەکانی کەرکوكو موسڵو دیالەو سەلاحەددین بەشێوەیەکی ئەوتۆ کە لە ئاست پۆلێنکردنی هەریەکەیان بێت بە پێی ئەو کەسانەی کە کاری تێدا دەکەن لە جۆری ڕەگەزو ئاینو نەتەوەو پەیوەندی ئەو کەسە بە نەتەوەکانی دیکەوە لەسەر بنەمای پەیوەندییە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکان.

ئەمەش لەوەدا سەرچاوەکان یەکلا دەبنەوە کە سیخوڕی ئۆپراسیۆنەکانی دیجلە کارکردنە بۆ ستراتیژێکی دوارۆژیی هەنووکەیی کە لەگەڵ بارە سیاسییەکەی لەوەو دوای عێراقدا بگونجێت کە جۆرێکە لەو چالاکییە سەربازییانەی کە جاران لەکاتی هاتنی ڕژێمی بەعس بەکاری دەهێنا لە شێوەی (حەرەس قەومی) کە زیاتر عەرەبەکانی ڕادەکێشایە نێو ئەو چالاکییەوە بەناوی تاڵانو سووتانەوە خەڵکی هان دەداو ڕایەڵەی نەتەوایەتی عەرەبی بەکاردەهێنا بۆ مەرامەکانی خۆی کە هەروەکو ئەوەی ڕوویدا لە ڕووداوەکانی دەورووبەری دێیەکانی کەرکوك لەو ساڵانەدا.

٣. ئۆپراسیۆنەکانی دیجلە، وەکو هێزێکی پاشەڕۆژی ناوچەکە بەکار دەهێندرا لەلایەن حکومەتی بەغداوە بۆ ئەو گۆڕانکارییانەی کە ڕوو دەدا لە ناوچەکە بەتایبەتی لەتای بەربەرەکانی دەزگاکانی ئەتۆمی ئێرانو ڕووخاندنی (بەشار ئەلئەسەد) لەدوا ڕۆژدا، خۆبینینەوەی ئەم هێزە بەرچاوی لەوەدایە کە خۆی کۆبکاتەوە بۆ ئەو ڕووداوە سیاسیو هەنوکەییانەی کە لەسەر گۆڕەپانی ناوچەکە ڕوو دەدەن یا لەدوا ڕۆژدا گۆڕانکاری لە دەوڵەتەکانی دەورووبەردا دەکات، کە خۆبینینەوەی دروستکردنی هێڵێکی تەماس بۆ ناوچەکانی عەرەب نشین لەگەڵ کورد لەلایەك، لەلایەکی تریش دروستکردنی هێڵێکی سەربازی بۆ پاراستنی یان بۆ گواستنەوەی چەك بۆ ناوچەکانی دەورووبەر لە یارمەتی حکومەتەکانی ئێستای سوریا یان لەکاتی ڕووخاندنی حکومەتەکە کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەبێتە تێکچوونی تەرازووی ناوچەکەو دەور دەبینێت لەو گۆڕانکارییانەی کە لەبەر چاو ڕوون نین یان لەدوا ڕۆژ ڕوو دەدەن لەناوچەکەدا. کە دۆسیەی کوردو شیعەو سوننە لەلایەك یەکلا دەکاتەوە لەلایەکی تریش بەربەرەکانی شیعەکان یان ئەو دەوڵەتانەی سەر بەشیعەن یان ئەو حیزبانەی لە ژێر باڵی شیعەدان، چاوەڕوانی گۆڕانکارییەکانی دوای ڕووخانی (بەشار ئەلئەسەد)ن، ئەویش خۆی دەبینێتەوە لە ترسی هەرەس هێنانی نەخشەی ناوچەکە یان هاتنە سەر حوکمی ئەوانەی لە دوای (بەشار ئەلئەسەد) دێن. بۆیە ئۆپراسیۆنەکانی دیجلە هەمان حەرەس قەومی جارانە بە بارێکی تردا یان هەمان ئەو هێڵە سەربازیو سیاسییەی سەردەمی دەوڵەتی عوسمانییە کە تا ڕادەیەك هەمان ئەو سنوورانەی دیاری کردبوو کە ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە دیارییان کردووە وەکوە ناوچەیەکی کوردنشین لەگەڵ عەرەب نشیندا.

٤. ناروونییەكی بەرچاو دیار بوو لەلایەن حیزبەو لایەنەكانی ناوچەكە لەپای بەرگری كردن یا بەرگری نەكردن لە ئۆپراسیۆنەكانی دیجلە بەتایبەتی لەنێوان عەرەبو توركمانو مەسیحیو كورددا.

بۆ نموونە توركمانەكان تاوەكو ئێستاكە هەڵوێستێكی روونیان نیە بەرامبەر ئۆپراسیۆنەكانی دیجلە ئەویش خۆی دەبینێتەوە لە روانگەی بینینیان بۆ سیاسەتی توركیا لەگەڵ عێراقدا، بۆیە بەرچاو روونی (الجبهة التركمانية) لەوەدا خۆی دەبینێتەوە كە تا چەندێك لەبەرژەوەندی توركیادایە لە ئێستاو لە دوارۆژ، ئەمە لەلایەك لەلایەكی تریش تا چەندێك توركمان سوودبینە لە هاتنی ئەم هێزە سەربازییە بەو شێوەیەی لە خزمەتیاندا بێت، بەڵام ئەوە روون نییە دوا رۆژی ئەم ئۆپراسیۆنە لە بەرژەوەندی تەنهای عەرەبدا كاردەكات یان نا، بۆیە راگەیاندنەكانی توركمان دوو فاقیانە كاریان كردووە لەپێناو بەرژەوەندی خۆیاندا بۆ ئەم هێزانە چونكە ئەوەی دەبیندرێت لە كاتی ئاهەنگێكی سەربازییان لە كەركوك بەشێك لە توركمانەكان ئامادەی ئەو ئۆپراسیۆنە بوونو هەندێكیشیان نكوڵیان لەو بەشداربوونە كرد، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە جێگری عەبەوڵئەمیر زەیدی توركمانێكی خەڵكی كەركوكە، بۆیە ئەو پرسیارە قوت دەبێتەوە كە تا چەندێك ئەو ئۆپراسیۆنە لە خزمەت توركماندا بووە.

بەڵام عەرەبەكانی كەركوك بەتایبەتی سوننە مەزهەبەكان كپییەكیان پێوە دیارە لەناروونی ئۆپراسیۆنەكانی دیجلە، ئایا تەنها خزمەت بەعەرەب دەكات یان خزمەت بە عەرەبی شیعە دەكات، بۆیە دەبینین لە پێشوازیكردنیاندا تا رادەیەك ناروونەو سەرچاوەكەی لەوەدایە چاوەڕێی دووا رۆژی چالاكییەكانی ئەم ئۆپراسیۆنەن، بەڵام لەسەر باری ئاشكراداو لە راگەیاندنەكانیاندا بەرگریو پشتیوانیان لێ كردووەو واییان بەباش زانییوە كە ناوچەكەیان هێزێكی عەرەبی بیپارێزێت یان هەندێكیان وا بیریان كردۆتەوە كە دوا رۆژی عێراق پێویستی بەوە هەیە كە ببێتە سێ پارچەی فیدراڵی كە لەو كاتدا بوونی ئۆپراسیۆنەكانی دیجلە دەبێتە ئاستەنگێكی گەورە لە بەردەمیان ئەگەر ناوچەكە تووشی گۆڕانكاری بێت بۆیە بە شێوەیەكی گشتی پشتگیری لە ئۆپراسیۆنەكانی دیجلەیان كردووە لە پای ترسێكی شاراوەدا كە لەدوا رۆژ بەدەر دەكەوێت.

كورد وەكو هێزو دەسەڵاتو حیزب لە ناوچەكەدا هەموویان بۆ چوونەكانیان لەوەدا سەرچاوەی گرتووە كە جوڵەیەكی ناسروشتی هەیە لە شوێنەكاندا بەتایبەتی ئەو شوێنانەی كە تاوەكو ئێستاكە كێشە لەسەرن كە خۆی دەبینێتەوە یان خۆ ئامادەكردنە بۆ ئۆپراسیۆنێكی سەربازی گەورەی دوا رۆژ، چونكە لە (٦)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (٢٠١٢)دا جوڵەیەكی گەورەی ئۆپراسیۆنەكانی دیجلە دەستی پێ كردووە ئەویش بە گواستنەوەی سی تۆپی دوورهاوێژ لە تكریتەوە بۆ كەركوكو كۆبوونەوە لەگەڵ فیرقەی دوانزەی دەورووبەری كەركوك بۆ كۆكردنەوەی زانیاریو كۆبوونەوەی هێزەكانیان لە گوندی (تەل ئەلوەرد) هەوڵدانیش بۆ كركردنەوەی ئەو زانیارییانەی كەوا لەو حیزبو رێكخراوە كوردییانەی كە لە كەركوكدا كار دەكەن، بۆیە دەبینین لە یەكێ لە جوڵەكانیاندا لەگەڵ فیرقەی دوانزە خۆیان گەیاندە سەر رێگای سلێمانی – لەیلان بەرەو گوندی خاڵۆ بازیانی.

لەلایەكی تریشەوە ئۆپراسیۆنەكانی دیجلە لەپەیوەندی بەردەوامدا بووە لەگەڵ هێزە سەربازییەكانی ناو كەركوك بۆ دانانی نەخشەو ستراتیژی سەربازی بۆ كۆنترۆڵكردنی بارەگاكانی ئاسایشو پۆلیسو بارەگا حیزبییەكان هەر ئەمەشبوو وای كرد وەكو كورد دژی ئۆپراسیۆنەكان بوەستنەوە، هەر یەكە لە حكومەتی فیدراڵی كوردستانو پارێزگای كەركوكو ئەنجوومەنی پارێزگا بەرپەرچی بدەنەوەو بەیاننامەی نارەزایی دەركەن كە تەنها عەرەبەكانی كەركوك هۆڵی كۆبوونەوەكەیان بەجێهێشت.

هەروەها ئۆپراسیۆنەكانی دیجلە بەهانەی ئەوەی كە بەشێك لەو فەرماندە سەربازییانەی ناوچەكانی دیالەو كەركوك سەڵاحەددین لە ئاستی پێویستدا نین بۆیە دەستیان كردووە بە گۆڕینی بەشێك لەو فەرماندە مەیدانییانە بەتایبەتی ئەوانەی كە كوردن هەروەكو ئەوەی لە پارێزگای سەڵاحەددین روویدا.

هەروەها لە (٨)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (٢٠١٢)دا بە ژمارەی (٣٧٢) كە لە دیوانی فەرماندەی گشتی هێزەكانی چەكداری عێراقەوە هاتووە ئەوە دەخاتەڕوو كە هەموو تەشكیلاتەكانی بەرگریو ناوخۆ لە پارێزگای كەركوكو دیالە دەبێت سەر بە ئۆپراسیۆنەكانی دیجلە بنو لەژێر چاودێری ئەواندا كار بكەن كە ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەستنەوەی هەموو دەسەڵاتەكانی سەربازی ئەمنی كەركوكە بەو هێزەوەو لە پای چالاكییەكانی ئەواندا كار بكات.

لە (٣)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠١٢)دا بەپێی بەڵگەنامەیەكی نهێنی ئەوە دەخاتەڕوو كە ئۆپراسیۆنەكانی دیجلە لە هەوڵی دامەزراندنی (٣٠٠٠) سێ هەزار سەرباز بوونەو لەسەر میلاكی فیرقەی دوانزە كاریان پێ كراوەو هەوڵی گواستنەوەی باری شارستانییان دراوە بۆ كەركوكو هەموو ئەو سەربازانە لە نەتەوەی عەرەبن بە تایبەتیش لە قەزای حەویجەو سەڵاحەددینو دیالەو بەغدا. لە كارێكی چاوەڕوان نەكراودا لە (٣)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠١٢) دا هەموو چالاكییە ئەمنییەكانی پارێزگای سەڵاحەددین كردووتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوەو لە ژێر رێنمایی ئەودا كار دەكات كە ئەمەش خۆی لە خۆیدا جۆرێكە لە فراوانكردنی ئۆپراسیۆنی دیجلە.

بە پێی چەند بەڵگەنامەیەكی فەرمی نهێنی ئەوە دەخاتەڕوو كە نوری مالیكی سەرۆك وەزیرانی عێراق داوا لە هێزەكانی سوپای عێراق دەكات لەشارەكانی كەركوكو دیالەو موسڵو سەڵاحەددین چەكەكانیان ئامادە بكەنو لە حاڵەتی ئامادەباشیدابن بۆ هەر ئەگەرو سیناریۆیەك كە روو بدات. لە یەكێك لە بەڵگەكاندا كە ژمارەی (٢١١) ی لەسەر لە رێكەوتی (٤)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠١٢)دا دەرچووەو ئاراستەی فەرماندەی ناوچەی كەركوك كراوە

تێیدا چەند ووردەکارییەکی خۆسازدان و ئامادەباشی دوویات کردووەتەوە بۆ ئەوەی هێزە چەکدارەکانی سوپای عێراق پابەند بن بە بریارو راسپاردەکانی فەرماندەی هێزە چەکدارەکانی عێراق.

لە نووسراوێکیش کە ئاراستەی سکرتارییەتی نهێنی گشتی وەزارەتی بەرگری عێراق کراوە جەخت لەسەر جێبەجێکرکردنی چەند رێنماییەکی نوری مالیکی کراوەتەوەو داوا کراوە بە پەلە ژمارەی پێکهاتەو یەکە چەکدارییەکان و پشتیوانەکانی سوپاو چەکە قورسەکانی وەکو هاوەن و یەدەگی تایبەت ئاماریان بۆ ئامادە بکرێت.

لە بەشێکی دیکەی نووسراوە نهێنییەکانی سوپای عێراقدا داوای ئەوەش کراوە کە دووبارە چاو خشاندنەوە بە هاوسەنگی هێز لە بارەگای سەرکردایەتی فیرقەی دوانزە لە پارێزگای کەرکوک بکرێتەوە.

لە پێشهاتێکی تازەو چاوەروان نەکراودا هێزەکانی ئۆپراسیۆنی دیجلە لە رێگەی هۆزە عەرەبەکانی مەخمورەوە خۆیان دەگەیەننە هەولێرو هەولی کۆکردنەوەی چەکدار دەدەن بۆیە داوا لە چەکدارە عەرەبەکان دەکەن کە هەزار کەسیان بۆ کۆبکەنەوەو وەکو سەرباز دایانبمەزرێنن بەلام تا ئێستاکە روون نییە ئەو کۆبوونەوەی هۆزە عەرەبەکان و ئۆپراسیۆنەکانی دیجلە بەچی گەیشتووەو چی بەسەر هات.

بەلام ئەوەی چاوەروان نەدەکرا لەسەرهەلدانی یان فراوانبوونی هێزەکانی (داعش) لە عێراقدا بە تایبەتی لە ناوچەکانی موسل و سەلاحەددین و کەرکوک و رومادیدا، بوو بە دەرئەنجامی هەلوەشاندنەوەی هەموو ئەو دەزگا سەربازییانەی کە لە کاتی رژێمەکەی مالیکیدا دروست کرابوو وەکو ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە.

ئەوەی تاوەکو ئێستاکە نەهێنییەو شرۆڤەی سەربازی تایبەتی بۆ نەکراوە ئەوەیە کە ئەو ئۆپەراسیۆنە زەبەلاحەی دیجلە نەیتوانی لەبەردەم هێرشێکی لەناکاوی داعشدا خۆی رابگرێت و لە هەمان کاتدا بوو بە هەلوەشاندنەوەی هەموو پێکهاتەی ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە کە لە مانگی حوزەیرانی سالی (٢٠١٤)دا بە روونی بەرچاو دەکەوێت لە هەمان کاتدا شتێکیش نەما لە رووی سەربازییەوە بە ناوی (ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە)وە.

نەهێنی گەورە لەوەدایە کە ئایا ئەو جبەخانە گەورەیەی ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە لە رووی چەک و کەرەستە سەربازییەکانەوە بۆ چی بە بێ تەقە کردن لەلایەن (داعش)ەوە دەستی بەسەردا گیرا، یا ئەمە مانۆرێکی پێشوەختە بووە ئامادەکراوە بۆ گۆرانکاری ناوچەکە لە داهاتوودا.

ئەوەی جێگەی باسە ئەو ناوچانەی کە ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلەی تێدا بوو ئێستا شوێنێکی بەرفراوانە لە ژێر کۆنترۆلی هێزی پێشمەرگەداو لەو پێناوەدا گەلێك چالاکی سەربازی ئەنجام داوە.

*** سەرچاوەکان:**

١. رۆژنامەی باس ژمارە ١١٧ رۆژی (١٣)ی تشرینی دووەمی سالی (٢٠١٢).

٢. گۆڤاری الانصات المرکزی ژمارەکانی ٥٤١٠، ٥٤١٣، ٥٤١٤، ٥٤١٥، ٥٤٣٣، ٥٤٣٤، ٥٤٤١، ٥٤٤٢، ٥٤٤٣.

# * ناسنامەی کەرکوك و ناوچە دابڕێنراوەکان بەپێی بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکان:-

مەسعود عەبدولخالق

**یاسایی ئەو داوایە:**

دیاریکردنی سنووری هەرێمی کوردستان بە هەموو ماناو پێوەرە یاسایی و سیاسی و ئیدارییەکان رەوایە، فەقیهە یاساییە بەناوبانگەکانی نێودەوڵەتی دیاریکردنی سنوور بە کۆتاییهێنان بە کێشەو دەستدرێژی دەزانن، نەبوونی سنوور لەگەڵ سەردەمی ئێستاو میساق و رێکەوتنامە نێودەوڵەتییەکان ناگونجێ، بۆیە لە هەردوو سەردەمی (عصبة الأمم) و (أمم المتحدة) دیاریکردنی سنوورێکی روون و ئاشکرا یەکێك بووە لە مەرجەکانی بە دەوڵەت و ئەندام بوون لەو دەزگا نێودەوڵەتییە، تەقەلاو مانای جیابوونەوە نییە، بەڵکو چۆن ئوستانێك یان شارێك پێویستی بە دیاریکردنی سنووری شارەوانی ئیدارەکەی لەگەڵ شارێکی تری هەمان وڵات هەیە، ئاواش ئەو هەرێمە پێویستی بەو دیاریکردنە هەیە، هەرێمی کوردستان دەستوورییە و لە ساڵی ١٩٧٥ بە یاسای فەرمی دیاریکراوە[١]، نابوایە دەوڵەتی عێراقی (لایەن) بوایە لەو کێشەیە، بەڵکو کێشەکە لەگەڵ ئەو هەرێم و شارانەی کە سنووری کەوتووەتە سەر ئەو ناوچانە بوایە، بەڵام حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقی دەستیان بە ئاشکرا هەبووە لە دروستکردنی ئەو کێشەیە، بۆیە کێشەکە رووبەرووی ئەو بووەتەوە، هەر بۆیەش وا پێویست دەکات لایەنی نێودەوڵەتی سەرپەرشتی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە بکات، بەتایبەتی کە عێراق لەنێو بەندی (٧)ە، لەو روەوە دیپلۆماسی کورد کەمتەرخەمە.

*** بنەماو رەوایی ماددەی١٤٠:**

بنەماورەوایەتی دەگەڕێتەوە بۆدوو تەوەر، یەکەمیان بنەما یاساییەکانی هەرێم و عێراق، تەوەری دووەم بریتییە لە بوونی مێژوویی هەرێمی کوردستان.

یەکەم: بنەما یاساییەکانی(هەرێمی کوردستان) و(عێراقی فیدرالی)

بۆ ئەوەی بتوانین یاساییانە کێشەی ناوچە ناکۆکەکان بە (مناطق المتنازع عليها) وەسف بکەین، ئینجا بارێکی یاسایی بدەینە ئەو کێشەیە، پێویستمان بە دیاریکردنی باری یاسایی هەرێمی کوردستان وپەیوەندی لەگەڵ بەغدا هەیە، بەو شێوەی خوارەوە:

١- لەپێش دروستبوونی دەوڵەتی عێراقی لە ساڵی ١٩٢١ هەرگیز کورد و عەرەب(کوردستان و عەرەبستان) لەنێو عێراقێکی سیاسی پێکەوە نەژیاون، برا بوونە، بەڵام لە چوارچێوەی (دار الاسلام) نەك (دار العراق).

٢- ئەو ناوچەیەی دوای ناوی نرا عێراق یەك ویلایەت نەبووە، ویلایەتەکانی شارەزوور(دوای بووە موسڵ)، بەغدا، بەسرە بووە.

هەرچی ریشەی عێراقی فیدراله:

١- بۆ دروستکردنی دەوڵەتی عێراقیش پرۆژەی لۆرانس بۆ(٢) هەرێمی عێراقی بەناوی (عێراقی سەروو-بەغدا بۆ مەلیك عەبدوڵلای برا گەورەی مەلیك فەیسەل)، (عێراقی خواروو-بەسرە بۆ ئەمیر زەیدی برا بچووکی) مەلیك فەیسەلیش بۆ سووریا دیاریکرابوو[٣].

٢- پرۆژەی بەریتانیا بۆ تەواوی ناوچەکە بەو شێوەیە بوو:-

أ- ناوچەکانی شیعە سەربەخۆ بێت.

ب-ئیدارەی بەسرە لە بەغدا جیا بێت و کوێتیشی بخرێتە سەر.

ج- بەغدا مەملەکەتێکی سەربەخۆ دەبێت و دەدرێتە پادشایەکی عەرەبی.

د- هەموو ئەوانە تەنها بەناو عەرەبی لەژێر دەستی بەریتانیا دەبێت[٤].

٣- لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتی هاوچەرخ بناغەی سێ دەوڵەت لە خواروو (کەربەلا ١٩١٨-١٩٢٠) و ناوەراست (بەغدا ١٩٢٠-...) و لە کوردستان (سلێمانی ١٩١٨-١٩٢٣) دروست بوو.

٣- لەکاتی دروستبوونی دەوڵەتی عێراقی کوردستان (کە لەو کاتەوە بووە کوردستانی خواروو، دواییش بووە کوردستانی عێراق، هەر دوایش بووە شمال العراق!) خاوەنی دەسەڵات و هەرێمی خۆی بووە، شەرعییەتیشی هەبووە بەپێی رێکەوتنی سوڵتان-بەدلیسی، دوای ویلایەتێکی سەربەخۆش بەناوی ویلایەتی کوردستان هەبووە، یەك لە والییەکانی (حەمدی پاشا)ی کورد بووە[٢]، لە دوا ساتەکانی تەمەنی عوسمانیش بەپێی بروسکەی عەلی ئیحسان پاشای نوێنەری سوڵتانی عوسمانی لە ١٩١٨بۆ شێخ مەحموود کە دان بە حکومەتی شێخ مەحمود دەهێنێ لە کوردستان.

٤- لە رێکەوتنە نێودەڵەتییەکان، . . کوردستان خاوەنی هەرسێ پای دەوڵەت (هەرێم و گەل و دەسەڵاتی سیاسی).چ جای فیدرالی بووە، کە مەشمولە بە ماددەی (١)ی بەشی یەکەم و ماددەی (٥٥)ی میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان، ماددەکانی(٥٨-٦٠)ی (فصل العاشر- قبول اعضاء جدد) ي (مجلس الأمن)، بریارەکانی ژ:١٥١٤ی خولی(١٥)ی ١٤/ دیسمبر/، ١٩٦٠، بریاری ژ: ٢١٠٥ خولی (٢٠)ی دیسمبری ١٩٦٥، بریاری ژ:٢٦٢٥ی خولی ٢٥ی ٢٤/ئوکتوبەر/١٩٧٠، بریاری ژ: ٣٠٧٠خولی(٢٨)ی نۆڤمبری ١٩٧٣. .. هەموو ئەوانە داکۆکی لە ماف چارەنووسی گەلان دەکا کە یاساو بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتییە بۆ هەرێمی کوردستان.

٥- لەنێوان کوردستان و عێراق: مەرجەکانی لکاندنی کوردستان بە عێراق لە: راپۆرتی گەرانەوەی ویلایەتی موسڵ، دەستووری ساڵی ١٩٢٥، بەڵێنی حکومەتی بەریتانی و عێراقی هاوبەش، بەڵێنی عوسبە لە ساڵی ١٩٢٢، ١٠ بەڵێننامەکە، دەستووری ١٩٥٨، بەیانی ٢٩ حوزەیران، بەیانی (١١)ی ئازار، یاسای ئۆتۆنۆمی١٩٧٤، بەندی (٧) و بریاری ٦٨٨، بریاری ٩٨٦کە رێژەی ١٣٪تایبەت لە خۆراك بۆ کوردستان دیاریکرا لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکان....، یاسای ئینتقالی ٢٠٠٣، دەستووری عێراقی نوێ.. هاتووە.

٤- تەقەلاکانی دروستکردنی فیدرالی لە خواروو:
ا- پرۆژەی لۆرانس بۆ سەربەخۆیی بەسرە، پرۆژەی لکاندنی بەسرە بە دەسەلاتی هیندەوە، پرۆژەی فیدرالی بەسرە بە سەرۆکایەتی تالیب پاشا، دواییش پرۆژە بە ناوبانگەکەی (١٣)ی حوزەیرانی ساڵی١٩٢١ی خەڵکی بەسرە لە کەسایەتییە بەناوبانگەکان و مەسیحی و جوولەکەشی تیایدا داوایان کردبوو سەربەخۆیی بدرێتە ویلایەتی بەسرە[٥].
ب- تەقەلاکانی (فوراتی ناوەراست کە بریتین لە: حکومەتی کەربەلا، شۆرشی (٢٠)، تەقەلاکانی ا.کاشف غیتا، هاوپەیمانی فوراتی ناوەراست و بەکر سدقی، بەگشتی هاریکاری رابەرانی شیعە لەگەڵ سەرکردە کوردەکان لەگەڵ شێخ مەحمود، مەلا مستەفا.
٥- نەگونجانی سێ پێکهاتەکان لەژێر سایەی دەسەلاتی مەرکەزی، سەرهەڵدانی پشێوی لەنێوانیان..، لە کوردستانیش بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود تا ساڵی ١٩٣٢ی خاپاند، بزووتنەوەی شێخ ئەحمەد، ئینجا لە ساڵی ١٩٣٥ بزووتنەوەی بەکر سدقی لە شێوەی ئینقلاب لە بەغدا روویدا بۆ گێرانەوەی ماف سروشتی کوردستان، دوای جەنگی جیهانی دووەمیش سەرهەڵدانی حیزبە کوردستانییەکان و شۆرشی ئەیلول و... لەو کاتەوە تا ئێستا دیار و زانراوە.

*** دووەم: بوونی مێژوویی کوردستانی سیاسی:-**
١- مێژووییبوونی هەرێمی کوردستان بە سنوورێکی دیاریکراو زیاتر لە ٨سەدە وەك لەو توێژینەوەی بەردەستتدایە.
٢- نێودەوڵەتی هەرێمی کوردستان لە سەردەمی عوسمانی وەك ویلایەت بووە دوایش لە رێکەوتنامە نێودەوڵەتییەکان دانی پیا هێنراوە بەتایبەتی لە سیڤەر وسان ریمۆ.
٣-لەسەر ئاستی عێراقیش: هەر لە مەرجەکانی (راپۆرتی ویلایەتی موسڵ ص٢٢٨)سەبارەت بە یەکگرتنی عێراق و کوردستان، ئینجا ماددەی ١٦ی ئینتداب، ماددەی٤ی کۆنگرەی قاهیرە، دانپیاهێنانی بەریتانی لە ١٩١٩ بە چارەنووسی کوردستان و جارێکی تر لەگەڵ عێراق لە٢/ دیسمبر/ ١٩٢٢، بریارەکانی خولی(١٦)ی مانگی ١٩٢٥/١٢ی عصبە سەبارەت کورد، ١٠ بەڵێننامەکەی ساڵی١٩٣٢کە بە (عصبة الأمم) درا بەتایبەتی (بەڵێننامەی ژ:٩و١٠)....، و دانی پیاهێنراوە لە:١٩٣٦، ١٩٥٨، ١٩٦٦، رێکەوتنی١١ی ئاداری ساڵی١٩٧٠ تیایدا دان بە بوونی یاسایی ناوچەی کوردستان هێنرا وەك یەکەیەکی ئیداریش[٦]، لە کۆنگرەی (٧)ی حیزبی بەعس دان بەبوونی کورد لە عێراق هێنراوە، لە١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٤ برگەی(ج)ی ماددەی ٨ دەستووری هەموار کراوی ساڵی ١٩٧٠ تیایدا دانرا کە هەموو ئەو ناوچانەی زۆرایەتی کوردن وەبەر ئۆتۆنۆمی دەکەون، لە (١١)ی ئاداری ساڵی ١٩٧٤ یاسای ئۆتۆنۆمی جاردرا بۆ ئەو ناوچانەی زۆرایەتییەکەی کوردن، ئەو یاسایە گرنگی خۆی هەیە بۆ ئەو کێشەیە زیاتری لەسەر دەوەستین:
(بەپێی ماددەی (١)ی ئەو یاسایە (منطقة الكردستان) بووە کیانێکی یاسایی، لە برگەی (ج)ی ماددەی(١) شەخسییەتی مەعنەویشی پێدەدا، ئەوەش یاساییانە ماف ئەوەی دەداتێ سنووری خۆی دیاری بکا، لەبرگەی (ب) ی ماددەی (٢) عەرەب وکەمایەتییەکانی تر لەو ناوچە بۆ بەشێك لە یەکە ئیدارییەکەی (منطقة الكردستان) پۆلین دەکا)...، تا دەرچوونی (ماددەی٥٨ی قانون ادارة الدولة الإنتقالية) لە ٢٠٠٤، دوایش ماددەی ١٤٠ ی دەستووری نوێ، لەسەرئاستی نێو نەتەوەیش لە بریاری ژ:١٧٧٠ی رۆژی١٠ی ئابی ساڵی٢٠٠٧ (دانیشتنی ژ: ٥٧٢٩ نەتەوە یەکگرتووەکان)سەبارەت بەو ناوچەو دیاریکردنی (ستیڤان دیمستۆرا) بۆی.
٤- مادام هەرێمێکی دیاریکراوی هەیە و گەلێکی جیای لەسەر دەژی ئەوا بنەما یاسا نێودەوڵەتییەکانی چارەنووس دەیگرێتەوە کە بریتییە لە:
رێکەوتنی سوڵتان و کورد لە ١٥١٤، ئاماژەکانی کۆنگرەی بەرلینی ٢/ یۆلیۆ/ ١٨٧٨، بنەماکانی جامیعەی ئیسلامی، ئینجا کۆنگرەی پاریسی ساڵی ١٩٠٢، .. . تا دەگاتە بنەماکانی ماف چارەنووس لە ١٤ خاڵەکەی ویلسنی ١٩١٨ و لێدوانە هاوبەشەکەی بەریتانی - فەرەنسی لە ساڵی ١٩١٨، کۆنگرەکانی سان ریمۆ وسیڤەر لە ساڵی ١٩٢٠. هەروەها لە سەردەمی نەتەوە یەکگرتووەکانیش هەروەك لەسەرەوە نیشاندرا.
٥- تەنانەت ماددەکانی (٣٨-٤٠)ی لۆزانیشی کە نزیکە لە ماددەکانی (١٤١ و١٤٥)ی سیڤەر پاڵپشتی دەکا کە تیایدا هاتووە: جیاوازی نەکا لەسەر بنچینەی زمان و رەگەز و ئاین و چارەنووسیان بەپێی زۆرایەتیان لە ناوچەکە دیاری بکرێت بەهۆی راپرسی.
٦- لە کۆتاییدا ئەوە واقعی مێژوویی یاسایی هەرێمی کوردستان بووە (کە بنەما و رەوایی دەسەلمێنێ)، لە حکومەتی نوێی عێراق لە پاش ساڵی ٢٠٠٣ بە فەرمی لە برگەی(ب)ی ماددەی (٥٨) (قانون إدارة الدولة الإنتقالية) دان بە بوونی پرۆسەی تەعریب و دەستکاری سنووری ئیداری دەهێنی دژ بەکوردستان لەو ناوچەیە کراوە، ئەوە لە هەموو بەڵگەکان بەڵگە ترە کە رەوایی پێدەدا، لە سەردەمی حکومەتی بەعسیش دان بە تەعریب هێنراوە دژ بەکورد لە خاڵی(٨)ی رێکەوتنامەی (١١)ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠.

*** ناوچە ناکۆکەکان( دابرێنراوەکان ) لەیاسای نێودەوڵەتی :-**
لە کۆندا لەسەر ئاستی گوند و شار ناکۆکی لەسەر تخوب هەبووە، لەسەر ئاستی میرنشین و ئیمپراتۆرییەتیش لەسەر سنوور هەبووە، ئەوەی یەکەم لەو شوێنانەی دەسەلاتی حکومەت هەبوایە بە یاسا یان بە شەرع(جاریش وابووە بە نەریت) چارەسەر کراوە، بەلام لەنێوان ئیمپراتۆر و حکومەتەکان کەمتر بە یاسا چارەسەر کراوە، بۆیە سنوور لەژێر پێی دوا سەربازی شەرکەر بووە، ئیتر بەردەوام سنوور گۆراوەو ناوچەی ناکۆکی لێ دروست بووە، زۆربەی جەنگ و ناکۆکییەکان بەهۆی سنوور بووە، دوو جەنگی جیهانی لێ سەریهەڵدا.

دوای ئەوەی یاسای نێودەوڵەتی خەملی و دەوڵەتانی مۆدێرن دروستبوون بە سنوورێکی نێودەوڵەتییەوە، کۆمەڵێك کێشە بەناوی ناوچە ناکۆکەکان (المناطق المتنازع علیها) سەریهەڵدا بەتایبەتی لە کاتی دارشتنی سنوور، لەنێو وڵاتانی عەرەبی خەست تر بوو، چونکە زۆربەی ئەو سنوورانەی بۆیان دیاریکراوە دەستکردەو بنەچەیەکی مێژوویی و یاسایی و سروشتی نییە، . . لەنێویشیاندا عێراق لە هەمووان زیاتر ئەو کێشەیەی هەم لەگەڵ دەورووبەر و هەم لە ناوەخۆش هەیە، تا ئێستا بە چارەسەرنەکراوی بەجێ ماوە، هەندێ جار بەهۆی چارەسەر نەبوونی (ناوچە ناکۆکەکان) بووەتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ وەك ئەو کێشەیەی لەنێوان ئەرجەنتین وبەرازیل لە ساڵی ١٨٢٥ڕوویدا لەسەر ئۆرگوای وشەر ڕوویداو لەئاکامدا لە ساڵی١٨٢٨وا ڕێکەوتن کە ئۆرگوای ببێتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ، هیندو پاکستانیش لە ١٩٤٧ ئەو کێشە و شەڕەیان دروست بوو، بووە هۆی دروستبوونی بەنگلادێش لە ١٩٧١، ئێستاش بیابانی ڕۆژئاوا لەنێوان جەزائیرو مەغریب و مۆریتانیا بەو ئاراستەیە دەڕوات، هەندێ وڵاتانی تریش ئەو کێشانەیان هەروا ماوە، لەوانە:- ئەرمینیا لەگەڵ ئازەربیجان لەسەر ناگۆرنی کارەباخ، ئیمارات لەگەڵ سعودییە و لەگەڵ ئێران، لەنێوان ئیسرائیل و فەلەستین، لەنێوان یابان و چین، لەنێوان بەریتانیان و ئەرجەنتین، . . ئەوەی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی کەمێك بە کێشەی ناوچە دابراوەکانی کوردستان دەچێ ناوچەی(سدتنلاند) نێوان ئەڵمانیا و چیکۆسلۆڤاکیا بوو، کە ڕێکەوتنامەی (میونیخ)لێ مۆرکرا لە ٣٠/سیپتمبر/ ١٩٣٨، سدتلاند٨٠٠هەزار چیکی و نزیکەی ٣ملیۆن ئەڵمانی لێبوو، بڕیاریاندا وەك بڕیاریکی نێودەوڵەتی (ئەڵمانیاو فەرەنسا و ئیتالیاو چیکۆسلۆڤاکیا) کە بە ڕاپرسی ئەو کێشەیە چارەسەر بکرێ لە چوارچێوەی ماڤ گەلان لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان، یەکەم کۆنگرە کە گرنگی بە سنوور دابێت فردانی ساڵی ٨٤٣ز ومارسینی ساڵی ٨٧٠ز، بەپێی (بڕگەی ٢ی ماددەی ١ وبڕگەی ٣ی ماددەی ٥٢ی میساقی نەتەوە یەککگرتووەکان چارەی ناوچە ناکۆکەکان بە ڕاپرسی بووە، هەروەك لەنێوان چیك و ئەڵمانیا کرا، لە ١١ی مایسی ساڵی١٩٤٩نەتەوە یەککگرتووەکان بڕیاری ژ٢٧٣ی دەرکرد بۆدیاریکردنی سنوورو بەرقەراری ئاشتی نێودەوڵەتی، جا دەوڵەت بێت یان هەرێمی فیدراڵی و ئۆتۆنۆمی بێت.

لە ڕاستیدا لەنێوان ئەو دەوڵەتانە مانای (ناوچە ناکۆکەکان) یاساییانە دەبێ، لەنێو خۆی وڵاتێك کەمتر ئەو ناوە یاساییەی پێدراوە، لەوانە: ناوچە ناکۆکانی نێوان ئیسرائیل و دەسەڵاتی فەلەستین لە بارەی (زەمینی داگیرکراوی ١٩٦٧)، لەنێوان دەوڵەتی سودانی و حکومەتی هەرێمی خوارروو لەسەر ناوچەی (ئەبییە)[٧]، لەدوای دروستبوونی عێراق لە ١٩٢١ هەر کاتی دیاریکردنی (ئیقلیمی کوردستان)هاتبێتە پێش ئەو کێشەیە هەبووە لە: ١٩٣٦، ١٩٥٨، ١٩٦٦، ١٩٧٠، ١٩٧٤، ١٩٨٣، ١٩٩١، تا دەرچوونی، ماددەی٥٨لە(قانون اداره الإنتقالییه-٢٠٠٤)، دوایش ماددەی ١٤٠ی دەستووری، لەسەر ئاستی نێو نەتەوەییش لە بڕیاری ژ:١٧٧٠ی ڕۆژی ٢٠٠٧/٨/١٠ (دانیشتنی ژ: ٥٧٢٩)سەبارەت بەو ناوچە و دیاریکردنی (ستیڤان دیمستۆرا) وەك نوێنەری نەتەوە یەککگرتووەکان بۆ ناوچە ناکۆکەکانی دەورووبەری کەرکوك.

لەدوای ٢٠٠٣لە چوارچێوەی دەستووری عێراق زاراوەی ناوچە ناکۆکەکان سەریهەڵدا، لەلایەك ئیجابییە کە ناوێکی یاسایی لێنراوە وەك ئەوە بێت لەنێوان دوو دەوڵەت، لەلایەکی تریش سەلبییە چونکە بە مسۆگەر ئەو ناوچەیە کوردستانییە بیدەیتە (ناوچەی ناکۆك) کە شەڕیکێکی لە خۆڕایی بۆ خۆت پەیدا دەکەی.

سـنـووری ئـەو نـاوچـەیـە: زۆرجـۆرەڤـاکـتـەرهـەیـە بکرێتەپێوانە بـۆ چارەسـەرکـردنـی کێشە ودیاریکردنی سنووری نێوان دوودەوڵـەت ودوومیللەت و دوو هەرێم.. بریتین لە:

١-سنووری جوگراڤ کە بریتییە لە بەربەستێکی سروشتی نێوانیان وەك چیاوڕووبارو دەریا..

٢- سنووری مێژوویی واتە ئەو ناوچەیە هەرلەژێر دەستی ئەو میللەتە بووەو دەسەڵاتی سیاسیان بەسەردا زاڵ بووە وەك: ئەمریکا، بەریتانیا، ئێران، ڕوسیا...هتد.

٣-لەسەر بنچینەی ڕەگەزی وئاینی واتە سنووری لەگەڵ سنوورێکی تر بەوە دیاری بکرێت کە زۆرایەتی ناوچەکە لەڕووی ڕەگەزی وئاینی لەکام لا زیاتر بوو لەسەردەمی نوی ماڤ چارەنووس وزۆربەی ڕێکەوتنامە نێودەوڵەتییەکانیش لەسەر ئەو بنچینەیە دروست.

هەرمیللەت وڵاتێك خاوەنی ئەو جۆرەسنوورانە نەبێ سنوورەکانی (دەستکرد)ی پێدەوتری و عادەتەن کێشەی سنووری هەیە چ لە ناوەخۆ چ لەگەڵ دەرەوە، عێراق نموونەیەکی زەقی ئەو جۆرە کێشەیە، جگە لە ئوردەن وسووریا کە پێکەوە دروستکران بەپێی ماددەی ٩٤ی سیڤەر ئەگینا لەگەڵ هەموو لایەك کێشەی سنووری هەیە، لەگەڵ تورکیا بۆ یەکەم جار لیژنەی (عصبة الأمم)هات بە دوو ساڵ ئینجا توانیان سنوورێك بەناوی برۆکسل[٨] دیاری بکەن، لەگەڵ سعودیەو کوێت و ئێران تائەو ساتە کێشەی سنووریان ماوە، لەناوخۆشی کێشەی سنووری لەگەڵ کوردستان هەر هەبووە، ئێستا بریتین لەو ناوچانەی سەرووی ویلایەتی موسڵ یاخود ئەو سنوورەی کە لەکێشەی(ویلایەتی موسڵ) دیاریکراوە، ئەو شارو شارۆچکانەش دەگرێتەوە:ژەنگال-شێخان-گوێر-مەخمور-دیبەگە-سەرگەڕان-دوبز-پردی-کەرکوك-قەرەتەپە-داقوق-دووز-مەندەلی-خانەقین-..کە دەکاتە لە٤٢٪ی کوردستانی خوارروو.

*** ئەسڵی ئەو کێشەیە:**

هەڵبەتە سەرچاوەی هەموو کێشەکان لە دابەشی وبێبەشکردنی کورد دێت کە لە دابەشییەکانی میراتی عوسمانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست و لە ڕێکەوتنەکانی سایکس-بیکۆ ١٩١٦ تا لۆزانی ١٩٢٣ دێت، بەڵام خودی ئەو کێشەیە ریشەیەکی تایبەتی بە خۆشی هەیە، یەکەم جار لە ساڵی ١٩١٦ لەماددەی(١)ی ڕێکەوتنی سایکس-بیکۆ ئەو ناوچەیە جیاکرایەوە پیتی (B)ی پێدرا، بەڵام نەخرایە سەر

عێراق تەنها خرایە بەشی بەریتانی، دوای ئەوەی بەریتانیا عێراقی دروست كرد و سنووری بۆ زیادكرد لە عێراقی عەرەبی تێپەری بۆعێراقی عەجەم و دوایش كوردستانی خوارووشی گرتەوە، ئینجا بیر لە تەعریب كردنی ئەو ناوچانە كراوە، یەكەم تەعریب لەلایەن بەریتانیا كرا ویستی شێوازێكی عەرەبی بداتە ویلایەتی موسڵ لەكاتی كێشەكەی ئەو ویلایەتە لە ١٩٢٣- ١٩٢٥، بە تایبەتی ناوچەكانی كەركوك تا موسڵ پرۆسەی تەعریب بەناراستەوخۆدەستی پێكرلەحكومەتی(یاسین هاشمی)یەوە[٩] تا ١٩٦٣، لە دوای ئینقلابی حیزبی بەعس لە ١٩٦٣ و ١٩٦٨ بە ڕاستەوخۆ و بەرنامەی ڕێژی دەستی پێكرد.

*** گەشەو ئاڵۆزبوونی ئەو كێشەیە:**

هەر كێشەیەك ڕەهەندێ تری بەدەر لەلایەنە ئاساییەكانی خۆی بە سەلبی بەشداربن زیاتر ئاڵۆز دەبێ، ئەو كێشەیەش زیاتر بەوەی ئاڵۆز بوو لایەك لێی باڵادەست بووەو پشتیوانی نێودەوڵەتیش هەبووە، لای تریشی ژێر دەستەو لاواز بووە، سەرەرای ئەوەش چەند هۆكارێكی تر ئەو كێشەیەی دروست و ئاڵۆزتر كردووە، ئەوانەی خوارەوەیە:

١- جیاكردنەوەی ئەو ناوچەیە لە پێش پرۆسەی تەعریب: یەكەم جار ئەو ناوچەیە لە ڕێكەوتننامە شوومەكەی سایكس-بیكۆی ١٩١٦ لە ویلایەتی موسڵ جیاكراوە، لە ماددەی(١)ی ئەو ڕێكەوتنە بە روونی ئاڵێت ناوچەی (B)بۆ دەوڵەتێكی عەرەبی ئامادە دەكرێ.

ناوچەی (B) نێوان هەردوو هێڵی پانی(٣٤- ٣٥)[١٠] دەگرێتەوە، باقی ویلایەتی موسڵ درا بە(فەرەنسا)، دوایی لە كۆنگرەی سان ریمۆی ١٩٢٠ بەریتانیا فەرەنسای قایل كرد ویلایەتی موسڵ بداتەوە بە بەریتانیا، لەو لایەش توركیای نوێ بە سەركردایەتی ئەتاتورك دانی بەوە نەهێنا كە ویلایەتی موسڵ موڵكی توركیا نەبێ، هەروەك لە (میساقی توركیا- ماددەی-١-)[١١] وای تۆماركردبوو، پاساویشی ئەوەبوو كە ئەو ناوچەیە لەدوای ئاگربەستی مودرسی١٩١٨ و جەنگی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨)داگیر كراوە، تا لیژنەی عوسبە هات، دای بە بەریتانیا و ئەویش عێراقی لێ دروست كرد.

٢- لەپاش ئەو هەنگاوە سیاسەتی بەریتانیا وابووە كەركوك لەكوردستان جیا بكاتەوە، تاگەیشتە شێوەی فەرمی لە ١٩١٩بە فەرمی (كاپتن ستیڤان لۆنكرینگ-جێگری حاكمی كەركوك) كەركوك لەژێر دەسەڵاتی كورد دەربهێنرێت[١٢].

٣-ئەو ئامارو نەخشانەی بەریتانیا پێشكەشی لیژنەی (عصبة الأمم)كرد لە كێشەی ویلایەتی موسڵ و لەتەقەلای بەزۆر لكاندنی خوارووی كوردستان بە عێراقی عەرەبی زیاتر ئەو كێشەیەی ئاڵۆز كردووە، چونكە ناسنامەی دەوڵەتی پێشنیاركراوی عێراق لە ڕێكەوتنامەكانی سایكس پیكۆو سان ریمۆو سیڤەر بە ناسنامەیەكی عەرەبی هاتبوو سنوورەكەشی كەمێك سەرووی بەغدا تا بەسرە، بۆ ئەوەی كوردستانی خوارووش بلكێنرێ ئەوا بەریتانیا ناچار ئاماروخشتەی چەواشەی لەسەر كوردستان بڵاودەكردەوە بەلای عەرەبی دەشكاندەوە، وەك نموونە دەڵێ عەرەب لەسلێمانی زۆرە، ئینجا بەوەش نەوەستا لە ئاماری٢٠/ كانونی یەكەم/١٩٣٠دەڵێ كەركوك٣٠٪ عەرەبە ٢١٪ی توركمان و٥٪یش كورد!.

٤- یاسای ئۆتۆنۆمی ساڵی ١٩٧٥ كە لەلایەن حكومەتی عێراقەوە دەرچوو، دیسان ئەو ناوچانەی لە هەرێمی كوردستان جیاكراوە كە بە (منطقة كردستان للحكم الذاتي) ناوبرا.

٥- دەرچوونی بڕیارەكانی نەتەوە یەكگرتووەكانی پابەند بە بەندی (٧)ی میساقی نەتەوە یەكگرتووەكان هەر هەمووی ئەو ناوچانەی بەدەر لە هەرێمی كوردستان پۆلین كرد، لەپێش هەموویان ناوچەی ئارامی سەرووی هێڵی (٣٦)، ئینجا بڕیاری ٩٨٦ی نەوت بەرامبەر خۆراك ڕێژەی ١٢٪ بۆ كوردستان هەژمار كرد كە تەنها پارێزگاكانی دهۆك و هەولێر و سلێمانی دەگرتەوە.

دوای داگیركردنی ئەمریكاش هەر لەسەر ئەو سیاسەتە ڕۆیشت.

٦- دەسەڵاتی كوردی لەماوەی ١٩ ساڵ لە حوكمی نەیتوانی سەركەوتوو بێت بۆ گێڕانەوەی ئەو ناوچانە، كارنامە یاسایی و سیاسی و ئەخلاقی و ئابوورییەكانی سەبارەت بەو ناوچەیە لاواز بوو، ئینجا كێشەیەكی وا ئاڵۆز و گەورە بە نەخشەو پلانێكی بچووك و خەم سارد ناكرێت، لە هەمووی گرنگتر نەیانتوانی سەرنجی پێكهاتەكانی تر لە توركمان و ئاشووری و عەرەبی ناوچەكە بۆ لای خۆیان ڕاكێشن، ئەوانیش زیاتر بەلای عەرەبە شۆڤێنییەكان لاربوونەوە، ئەگەرچی هەندێ وڵاتی دەورووبەر ڕێگر بوون، بەڵام ئەوە پاساوی ئەوە نادات كە پاكانە بۆ هەڵس و كەوتی بەرپرسانی كورد بكەین سەبارەت بە داخوازییەكانی توركمان و ئاشووری وەك پێویستە نەبوون، لەسەر (حەق) نەیانتوانی ئەوانە ڕاكێشنە ڕیزی خۆیان كەچی لایەنی بەرامبەر لەسەر (باتڵ) توانی ئەوانە ڕاكێشێن.

٧- هەر خودی ئەو ڤاكتەرانەی بوونە ئاڵۆزی كێشەی كورد لێرەش هەمان ڕۆڵ دەبێنن، لەودەمە لەهەمووان زەق تر وڵاتانی ئیقلیمی وجامیعەی عەرەبییە دژ بەوەن كەناوچە ناكۆكەكان ناسنامەی كوردستانی بدرێتی.

٨- لە هەمووی ئاڵۆزتر ئەوەبوو حكومەتی عێراق خۆی لایەن بووە لە ئاڵۆزكردنی، خۆی هەڵساوە بە تەعریب و كێشە دروستكردن، گوێی بە (١٠) بەڵێنامەكەی وەرگیرانی لە (عصبة الأمم) و (بەڵێنەكانی ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ)، یاسای نێودەوڵەتی و نەسڵی مانای دەوڵەت بوون و پارێزگاری و نوێنەرایەتی كردنی هەموو لایەك بە یەكسانی نەكردووە، هەڵساوە بەتەعریب كەبەشی هەرەبنچینەی ئاڵۆزكردنی كێشەكەیەو خستومانە دوا برگە.

٩- تەعریب:-

لە كۆنەوە تەقەلایەك لەلایەن نووسەری عەرەبی ئیسلامی هەبووە تا ناوی شارو وڵاتەكان بەزمانێكی پیرۆزو ڕەسەن گوزارش بكا، كە ئەو كاتی واباوكرا ئەو زمانە عەرەبییە، لەسەردەمی عەبدولمەلیكی كوری مەروان(٦٥-٨٦)ك بۆ تۆماری باج(خراج) زەوی ناوەكان لە هەموو وڵات بە عەرەبی

تۆمارکران، هەر لەسەردەمی ئەو لە٧٥ك بەرامبەر ٦٩٦ز زمانی عەرەبی کرایە تاکە زمانی فەرمی نەك هەر لەدەوڵەت بەڵکو بۆ تەواوی میللەتی موسلمان[١٣]، ئیتر ئەو ناوانە دووچاری سەرو گێلاك شکاندن بوون و لە ناوە هاوتا عەرەبییەکانیان نزیك دەکرانەوە، گرینادا بووە غرناطة، ئامێدی بووە عمادیە، (نۆ گرد) کرا (حدیثة)، دەیان گوت سنجار عەرەبییە لە(هذا سن جبل جار علینا)هاتووە[١٤]، سامەراش لە (سر من رای) هاتووە، لەسەر ئەو بنچینە لەلای توێژەری کورد رەگی تەعریب بۆ قوڵایی مێژوو و سەردەمی خەلافەتی ئیسلامی دەگێڕنەوە، جاریش وایە فەتحی کوردستان بە ئەنفالی یەکەم پۆلین دەکەن، بەوەش خزمەتێکی بەخۆرایی تەعریب و ئاڵۆزبوونی کێشەی ناوچە ناکۆکەکان دەکەن، ئەگەر ئەو ناوچە شانۆی تەعریب و تەماحی عەرەب بێت لە سەردەمی خەلافەتی ئیسلامی، ئەوا ئەو کێشەیە چارەسەر نابێت و ناشکرێ بڵێی کوردستانییە، بەڵام ڕاستییەکەی وانییە، جاروایە پێچەوانەی راست بووە، تەکرید هەبووە، هەروەك (تۆماس بوا) لە ل١٩٧ کتێبی (تأریخ الأكراد) و ڕاپۆرتی لێژنەی (تەحکیمی موصڵ ص١٤٨) زۆرسەرچاوەی تر هاتووە: تورك و عەرەب و ڕەگەزەکانی تر هاتوونە لەناو کورد تواینەوە، لە ڕاپۆرتەکانی بەریتانیش ئەوە دەردەخا کە لەسەردەمی عوسمانی تورك لەناو کورد تواینەوە[١٥].

دەکرێ بڵێین تەعریب هەبووە، بەڵام بەمەبەستی (پاکتاوی ڕەگەزی)نەبووە، لەکۆتاییدا سێ ڕەهەند زەمینەیەکی تەعریبی سازاندووە ئەگەر ئەو مەبەستەش نەبووبێ: یەکەمیان تەقەلا دراوە لەلایەن هەندێ فەقیە و مێژوونووس سەرجەلەی کورد(انساب الاکراد) بگێڕنەوە سەر عەرەب، لەکاتێکدا ڕەچەڵەکی کورد ئارییە نەك سامی، مێژووی زۆر قووڵە ئیبن خەلدوون بۆ نزیك لە نوح دەباتەوەو دەڵێ: (.. وقال ابن سعيد كان لأشوذ اربعة من الولد: إيران ونبيط وجرموق وباسل. فمن إيران الفرس والكرد والخزر، ومن نبيط النبط والسريان، ومن جرموق الجرامقة واهل الموصل، ومن باسل الديلم واهل الجبل)[١٦]، دووەم هەندێ سوڵتان ودەسەڵاتدار ڕاگواستنیان کردووە دژبەوانەی دژیان بوونە لە قازانجی ئەوانەی لەگەڵیان بوونە، ئەو پرۆسەیەش بە هەردوو دیو کوردی گرتووەتەوە، بۆیە هەندێ جار تەکرید دژ بە عەرەب و خەڵکی تر هەبووە هەندێ جاریش تەعریب، بەنموونە:هەریەکە لە ئیبن خەلدوون (١٤٠٦)م وئیبن ئەسیر(١١٦٠- ١٢٣٣)م دەڵێن لە سەردەمی (خەلیفە موعتەسەم)کوردەکان دەستیان بەسەر موسڵ داگرت، دوای بەزەحمەت شکاندنیان موعتەسەم بیری لەوە کردەوە کە خەڵکی عەرەبی لایەنگری خۆی بهێنێتە موسڵ، بەو شێوەیە یەکەم تەعریبی موسڵ لەوسەردەمی بووە، لەسەردەمی ئەمەویش زۆر خراپتر[١٧]، سێیەم لە فقهی ئیمامی شافیعی و میراتگرانی و فتواکانی ابن تیمیە عەرەب بەسەر عەجەم و کورد(فەزڵ) [١٨]کراوە، ئەو فەزڵکردنەی عەرەب بەسەر عەجەم لەلایەن هەردوو مەزهەبی شیعەو سونە-ئەوەی شیعە ئەوەندە تۆخ نییە، بەڵام بەبێ بنچینە (اهل البيت) فەزڵ دەکەن ئەوانیش هەر عەرەبن کاریگەری لە میللەتە لاوازەکان کردونۆربەی شام و فەلەستین و سەرووی ئەفریقا بەبێ فشاری دەسەڵات لەنێو عەرەب توانەوە.

کوردستان بەهۆی سەردەستەیی و بەرگەی بەهێزی نەتوایەوە تا لە کۆتایی سەدەی ١٩ بەرەبەرە لاواز کرا، بۆیە دەبینین لەدوای ئەو مێژووە بەرەبەرە کەرکوك و موسڵ ژمارەی دانیشتووانی کوردی لێ کەمدەبێتەوە، لە بەرامبەردا (بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٠٨)تورکمان زیاد دەکا شانبەشانی زیادکردنی عەرەب، لە پێش ئەوبەرەوارە لەگەڕیدەو نەخشەوئامارەکان بە ئاستەم باسێکی بوونی کەمی عەرەب و تورکمان کراوە، کەچی بۆ یەکەم جار لەلایەن(ئۆلیڤەر- ساڵی١٨٠٩) لە سەردانەکەی بۆ موسڵ دەڵێت: موسڵ٢٥٠٠٠عەرەب، ١٦٠٠٠کورد، ١٦٠٠٠تورکمان، ٨٠٠٠مەسیحی، ١٠٠٠جوولەکەی لێیە[١٩]، دوای ئەوەی عێراق لە ١٩٢١ دروستکرا لەلایەن بەریتانیا، تەقەلای بە عەرەبکردنی ئەو ناوچانە دراوە، تەعریبی ڕاستەقینە لە سەرەتای سەدەی بیست دەستی پێکرد و یەکەم جاریش بەریتانیا دەرگای کردەوە، لە ڕێکەوتنامەی سایکس-بیکۆی ساڵی ١٩١٦بۆ یەکەم جار ئەو ناوچانەی ناوی لێنرا(b) لە کوردستان جیا کردەوە، ئینجا حکومەتە عەرەبییەکانی بەغدا بە ناڕاستەوخۆ، ئەوە لە کەرکوکیش بەروونی بەدی دەکرێ لە بەڵگەنامەیەکی بەریتانی ساڵی ١٩٣٨ وا بەدی دەکرێ کە کورد بۆ یەکەم جار لەسەر ئاستی میللی هەست بەتەعریبی کەرکوك وتەقەلای سامان بردنی کوردبکەن، لەو بەڵگەنامەیە secret-ref.c/s/٣/fo.٣٧٠ ،٦٧١سلێمانییە- ١٩٣٨/٤/٦ مۆری (ولسون)ی پێوەیە دەڵێت لەناو خەڵك دروشمی ((نەوتی کەرکوك موڵکی کوردە)) بڵاوبووەتەوە، هەروەها دەڵێن ((لا الجمل حيوان ولا العرب إنسان))...واتە قین لە عەرەبیش دروست بووە کە پێشوو تر عەرەب لەناو کورد زۆر خۆشەویست بووە، واتە تەعریب هەست پێکراوە لەسەر ئاستی میللیش، ئیتر دوای ئەوانەش لە هەر ئامارێك بۆ ئامارێکی تر ژمارەی کورد کەم دەکا هەربە نموونە: لەنێوان هەردوو ئاماری ساڵانی ١٩٥٧ و١٩٧٧عەرەب لە (٢٨،٢٪بەرز بۆوە بۆ(٤٤،٤٪) هەرچی کوردە ڕێژەی کەم بۆوە لە (٤٨،٣٪) بۆ(٣٧،٦٪)، یەکەم بەڵگەنامەی فەرمی کە ئاماژە بە تەقەلای تەعریبی شاری کەرکوك و دەورووبەری دەدا لەدوای ساڵێك لە ئینقلابی ساڵی١٩٥٨ لەلایەن (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)، نووسراوی ژ:س/١٤٢ لە سەرکردایەتی فق٢ -استخبارات لە١٩٥٩/١/١٩بۆ سەرۆکی ئەرکان دەنێرن بەناوی (الحالة السياسية في المنطقة المسؤلية فق٢) دەڵێن: (سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاری داوە دوو ئەفسەری بەهێز بۆ کەرکوك بهێنێ (عبدالجليل الحديثي محافظ الكركوك وناظم طبقجلي قائدا للفرقة)، چونکە ئەو ناوچەیە زیاتر کوردن)، لەسەر دەستی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق، تا گەیشتە ساڵی ١٩٦٣ ی ئینقلابی بەعس تووند بوو، دوای نەمانی بەعس هێور بۆوە.

لەدوای ١٩٦٨تەعریب بووە فەرمی، ئەوەش قۆناغێکی تری ترسناکی تەعریبە، هەمان پرۆژەی (ارض بلاشعب لشعب بلا ارض)کە لە کۆنگرەی لەندەنی ساڵی ١٨٤٠درا بالمرستۆن دژ

بەکورد پەیرەو کرا، بۆ ئەو مەبەستە لایەك لە نامەیەکی جەمال عەبدولناسر بۆ کندی سەرۆکی ئەمریکا بلاودەکەینەوە لە بارەی (بە جوولەکە کردنی فەلەستین) زۆر وێچووی تەعریبی کوردستانە، لەنامەکە هاتووە:(قد اعطي من لايملك وعدا لمن لايستحق، ثم استطاع اثنان(من لايملك) و(من لايستحق) بالقوة والخديعة ان يسلبا صاحب الحق الشرعي حقه فيما يملكه وفيما يستحقه)[٢٠]، ئەوە پەیرەو کرا دژبە کورد لە کەرکوك لەلایەن برای عەرەبی خۆی و لە عێراقێك گوایە هەردوولا هاوولاتی و شەریکن، ئەو تەعریبە بووە هۆی گۆرینی نەخشەی دیمۆگرافی ناوچەکەو جێگیر نەبوونەوەی تا ئەو ساتەش، ئینجا ناوی ناوچەو شار و گوندەکانیشی لە کوردییەوە کردە عەرەبی، لە هەمووان ترسناك تربە بریاری (مجلس قيادة الثورة)بە ژ:٤١ لە٢٩ی کانونی دووەمی سالی ١٩٧٦ناوی کەرکوکیشی کردە تەئمیم[٢١]، لەپاشان دەولەت خۆی بە تەعریب هەلساوە بەو شێوەیەی خوارەوە:

١- مرسوم الجمهوري- بە مۆری ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر ژ:٦٠٨-١٩٧٥/١٢/١٥ هەردوو شارۆچکەی چەمچەمال وکەلاری لە کەرکوك دارنی وخستییە سەر سلێمانی.

٢- مرسوم الجمهوري- بە مۆری ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر ژ:٣٣ لە٢٥/کانونی دووەم/١٩٧٦تیایدا کۆمەلێك گۆرانکاری ئیداری و رەگەزی لە کەندیناوە وقراج دەکات، هەروەها بەپێی بریاری ژ:٥٥(محافظة التأميم) لە١٩٧٦/٣/٢ ناوی گوندو شارۆچکەکانی ئەوناوچەیە بگۆردرێت لە کوردی بۆ عەرەبی، لەوانە:زندانە بۆالنصر، یارمجە بۆ جدە، تۆغماغلو بۆ الخنساء...هتد، ئەو کاتی شۆرشی کوردیش نەمابوو تا بلێن ئەوە بەهۆی نا ئارامی بوو.

٣-مجلس قيادة الثورة- بە مۆری ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر -رقم القرار:١٦٠-١٩٨٧/٣/٢٩دەسەلاتەکانی (شمال العراق) بە هەردوو دەزگای تەشریعی و تەنفیزی کۆکردەوەو خستییە بەر دەست ئەندامێتی قیادە قوتری.

٤-لە بارەی گۆرینی ناسنامەی نەتەوەیی- مجلس قيادة الثورة -رقم: ١٩٩ /٦/٩ /٢٠٠١ ئەوەی لەسەر خاکی عەرەب دەژی بە عەرەب هەژمار دەکرێت بۆیە ئەو دۆخە نەریتیاوەی کە لەسەردەمی عوسمانی بۆ عەرەب بەنەرێنی ماوەتەوە چا بکرێت، بەو پێیە لە بریارێکی تریان بەژ:٢١/٣٤ کە پێشوو تر لە٥ی نیسانی سالی١٩٩٨دەرچووبوو جێبە جێ بکرێت: هەرکوردێك یان کەمایەتی تری نەتەوەیی خۆیان بۆ عەرەب گۆری ئەوا هەموو مافەکانی دەگەرێتەوە لەو شارە وەك عەرەب، ئەوەی ناسنامەشی راست نەکردەوە ئەوا یەکسەر دەگوازرێتەوە بۆ شارەکانی خواروو. ئەوە لەکاتێکدا بریارێکی تر دەرچوو لە (مجلس قيادة الثورة- بە مۆری سەدام حوسێن ژ:٨٥٠ لە١٩٨٨/١١/٢٧ ٤ ماددەیە، لە یەکەما دەلێت:بە هیچ جۆرێك نابێ عەرەب ناسنامەی نەتەوەیەی بۆ نەتەوە و رەگەزێکی تر بگۆرێ و هیچ پاساو هۆیەك وەرناگیرێ، بەلای کەمی سالێك زیندانی دەکرێ.

٥- مجلس قيادة الثورة ژ:١٦٠-٣/٢٩/ ١٩٨٧بە بریاری هەردوو (القيادة القطرية والقومية) عەلی حەسەن ئەلمەجید بکرێتە حاکمی رەهای کوردستان بە هەموو دەزگا حیزبی و ئیداری و سیاسی و عەسکەری و ئەمنییەوە، بە هەردوو دەزگای تەشریعی و تەنفیزی کوردستانیشەوە[٢٢].

٦- پلانێکی تەعریب بە فەرمی دارێژرا لە ٥ی نیسانی سالی١٩٩٣ بەپێی بریاری ژ:٨٧/١١/٣ بەناوی (لجنه الشمال) پێکهاتبوو لە: (مزبان خضر هادي، نوري فيصل شاهر، خضر عبدالعزيز الدوري، مزهرالعواد، وزير الداخلية، مدير جهاز المخابرات، مدير الامن العام، مدير استخبارات العسكرية) هەموو ئەوانە بە سەرۆکایەتی تەها یاسین رەمەزان، ٥ماددەی تیادا هاتووە، یەکەم داکۆکی رەها لە عروبەی کەرکوك بەهۆی پرکردنی لە عەرەب دەکا.

٧- مجلس قيادة الثورة -رقم:٦٣٢ ١٩٨٩/١٠/٧ بە مۆری سەدام حوسێن تیایدا هاتووە کە قوتابی بەهۆی زمانی کوردی ناکەوێ.

٨-امر وزير الداخليه-ژ:١٠٤٧٢-١٩٩٣/٩/١٩ مانەوەی تورکمان لە کەرکوك وکۆمپانیای نەوت.

٩- بەراستی مانای تەعریب لەو بریارە وەردەگرێ، چونکە رەنگە ئەوانی تر ناوی وەك (تەعریق) هەلگرێ.. تەها یاسین رەمەزان-ژ:٨٥/٢٠-١٩٩٧/١/٢٠بریارماندا لە جێی کوردەکان میسرییەکان تەعین بکەین. .

١٠- تەنانەت ئەو رەگەزپەرستییە دژ بەوانەش بوو کە لەگەل خۆیان بووە، ئەو عەشیرەت وسەرۆکانەی جاش وخزمەتکاریشیان بوونە، بروانە ئەو نووسراوە: (حزب البعث العربي الاشتراكي-ق ف التأميم ژ:١٧٧٨/٢ و نووسراوێکی تر بە ژ:٩١٨٧/٢٩لە١٩٩٨/١٢/٧ دەرچووە تیایدا بە توندی قەدەغەی بوونی هەرکی وزێباری لە ناوچەکانی پردێ و مەخموور و ئەو ناوچانە دەکا، داوا لە عەرەبەکان دەکا زەوی بەوانە نەدەن، لە نووسراوێکی تری سەیر کە بە ژ:١٣٠٥/٢٩ لە ١٩٨٨/٨/٢٩دەرچووە فەرمان دەکا بە سزای ئەو خانەوادە تورکمانیانەی کە خزاونە (افواج الخفيفه) و دەربکرێن وەك کورد.

١١- بەلگەی لەهەمووان بەلگە تر خودی حکومەتی عێراق دانی بە بوونی تەعریب هێناوە: لە برگەی(ب)ی ماددەی (٥٨) (قانون ادارة الدولة الإنتقالية-٢٠٠٤ز) دان بە بوونی پرۆسەی تەعریب و دەستکاری سنووری ئیداری دەهێنێ دژ بە کوردستان لەو ناوچەیە کراوە، لە سەردەمی حکومەتی بەعسیش دان بە تەعریب هێنراوە دژ بەکورد لە خالی(٨) ی رێکەوتنامەی (١١)ی ئاداری ١٩٧٠ (إعادة سكان القرى العربية والكردية الى اماكنهم السابقة..) ئەوە لە هەموو بەلگەکان بەلگە ترە کە رەوایی پێدەدا.

*** پاساوی عروبییەکان[٢٣]:**

لەراستیدا پاساوی بەرامبەر زۆر لاوازە، تا ئێستا بوێری ناکەن بلێن ئەو ناوچەیە سەر بە عەرەبستانە، یاخود هەرێمێکی عەرەبی بۆ ببیننەوە، تەنها تەقەلایان ئەوەیە بلێن کوردستانی نییە، باشترین بەلگەی عەرەبی نەبوونی ئەو ناوچەیە خودی تەعریبە، کە دژ بە هەموو رێساویاسایەکی مرۆیی وئاینییە، بۆیە ئەو کارە تایبەتە بە عەرەبی شۆڤینی نەك هەموو عەرەب، سەرجەم پاساوەکانیان ئەو چەند

خاڵەیە:
١- دەڵێن: ئەو ناوچانە عێراقین.
- هەندێکیشیان راوی بەڵگەنامەی مێژوویيان کردووە، هەندێ بەڵگەیان دەستگیر بووە، لەوانە:
(ا) دەڵێن لە سەردەمی عەباسی ئەو ناوچانە سەر بەغدا بووە. بەڵگەی بەریتانیا لە کێشەی ویلایەتی موسڵ خودی تاپۆی عوسمانی(دائرە التسجیل العقاري) کە لە١٦ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٠٨ دەرچووە دەردەکەوێ شارەزووریش سەر بە عێراق بووە.
(ب) لە رێکەوتنی شەریف حوسێن کوڕی عەلی لەگەڵ ماکماهۆنی بەریتانی بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی عەرەبی گەورە لە ساڵی١٩١٥، ئەوا ئەو ناوچانە تا ئامێدی و دیاربەکر و نسێبینی و هێڵی ٣٩ی تیابووە.
(ج) لەسەردەمی عوسمانیش هەندێ جار ویلایەتی موسڵ سەر بەبەغدا بووە.
(د)هەندێ جار باس لەوەش دەکەن کە نەك ئەو ناوچانە، تەواوی ویلایەتی موسڵ لە کێشەکەی نێوان تورکیا و عێراق پاساییانە بە عێراق درا، ئیتر ئەو ناوچانەش بەشێکە لە ویلایەتی موسڵ و عێراقین.
بەشێکی تر پرووپاگەندەی ئەوە دەکەن کە لە سەردەمی میدحەت پاشا ویلایەتی موسڵ خرایە سەر بەغداو ئیتر موڵکییەتی بەغدا بەسەر ئەو ناوچەیە پاساییە.
(ه) لەگەڵ زۆر پاساوی لاوازتر، لەوانە دەڵێن خۆ کەرکوك شارێکی کوردی نییە، زیاتر تورکمانی لێیە، عەرەب و ئاشووری و کەمایەتی تریشی لێیە، ئاواش باقی ناوچە ناکۆکەکان. دەڵێن ئەوەتا کورد لە ئاماری ساڵی ١٩٥٧ (٣\١) ی دانیشتووانی کەرکوك پێکدەهێنێ.

**کورتە هەڵسەنگاندنێکی ئەو پاساوانە:**

مەبەست لە هەڵسەنگاندن وەڵامدانەوە نییە، چونکە ئەو نووسینە خۆی لە خۆیدا وەڵامە، نابێ توێژەری بە ویژدان دەمارگیری هەبێ، دەبێ چی راستە داکۆکی لێبکا، ئەگەر ئەو ناوچەیە کوردستانی نەبێ و خاوەنی تری هەبێ دەبێ چاو لە مافی خەڵکی تر نەبێ لەسەر ئەو بنچینە قوول و ویژدانییە هەڵسەنگاندن دەکەین.

**١- پاساوی عێراقی بوونی ئەو ناوچەیە:**

ئەو پاساوە دوو بەشە، ئەگەر مەبەست لەوە بێت کە ئێستا ئەو ناوچەیە عێراقییە، کەس نکوڵی لەوە ناکا لەدوای ساڵی ١٩٢٠ (یان وردتر لەدوای ساڵی ١٩٢٥) چۆن هەولێر و سلێمانی وناوچەی قەندیل عێراقییە ئاواش ئەو ناوچە دابراوانە عێراقین، بەڵام ئەگەر مەبەستی مێژوویی بێت واتە لەپێش ساڵی ١٩٢٠ ئەو ناوچەیە عێراقی بێت ئەوا هیچ بنەمایەکی نییە، نەك ئەو ناوچەیە بەڵکو سەر بە ویلایەتی بەغداش نەبووە، ئینجا عێراقی عەرەبی نەگەیشتووەتە بەغداش، چ جای ئەو ناوچەیە، ئەو بابەتە دوای زیاتر بە بەڵگەنامە باسی دەکەین، چونکە ئەوانەی دەڵێن عێراقییە، مەبەستیان برگەی یەکەمە زیاترە نەك دووەم، ئەوەش لەڕووی یاسایی وسیاسی چارەکراوە بە بوونی دوومیللەت ودوو هەرێم لە عێراق لەسەرەتای دروستبوونی عێراقدا تا ئەو ساتە، بەڵام پێشێل کراوە، ئەگینا زۆر هەنگاو هەبووە و هەیە کە بریتین لە:

ا- بەریتانیا بە ناچاری دوای شەرێکی زۆر لە ساڵی ١٩١٩ وەك حوکمدار دەسەڵاتی کوردی بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمودی ناساندووە.
ب-راپۆرتی ویلایەتی موسڵ و مەرجەکانی لکاندنی خوارووی کوردستان بە عێراق کە بریتی بوو لە٢٥ ساڵی تر ئینتداب و پێدانی مافی چارەنووس بە کورد لەو شوێنانەی زۆرایەتین.
پ- لە بەیانە دوو قۆڵییەکەی بەریتانی عێراقی لە٢٨ی تشرینی دووەمی ساڵی١٩٢٢دیسان دان بەو مافە هێنرا.
ت-دوای (عصبة الأمم) لە وەڵامی سکاڵایەکی کۆمەڵێك سەرکردەی کورد لە رێنماییەکی تایبەتی بۆ بەریتانیای دەوڵەتی (ئینتداب) نارد کە بریتی بوو لە ٣ مادده تیایدا لە ماددەی دووەم داواکرابوو حکومەتێك بۆ کورد پێك بهێنرێت وچیتر بە هەڵە لێکدانەوە بۆ بریاری ڕۆژی١٦ی تشرینی یەکەمی ساڵی١٩٢٥ نەکرێ[٢٤].
ج- لە کۆنگرەی قاهیرەی ساڵی١٩٢١ دان بەبوونی هەرێمی کوردستان نراوەو لێژنەیەکی بۆپێکهات..
چ- ماددەی ١٦ی لائیحەی ئینتدابی بەریتانی دووبارە داکۆکی لە داننان بە حکومەت و هەرێمی کوردستان دەکاتەوە، ئەو لائیحەیە پێکهاتبوو لە (٢٠) ماددە، لەلایەن خۆشییەوە لائیحەی ئینتدابیش پاڵپشتی کردبووە سەر برگە (٤)ی ماددەی (٢٢)ی کۆمەڵەی گەلان.
ح- ماددەی (٤)ی دەستووری ساڵی ١٩٢٥ کە یەکەم دەستووری عێراق بوو بە (یاسای بنەرەتی) نێوزەد دەکرا تیایدا ئاڵای عێراق بە (٢) ئەستێرە دەستنیشانکرا[٢٥] بۆ ئەوەی گوزارش لە عێراق بکات کە لە دوو نەتەوەو دوو هەرێم پێکهاتووە[٢٦]، پێشوو تر ئاڵای عێراق یەك ئەستێرەی لەسەر بوو بۆ ماوەی ساڵێك وەك لە نامەی (مس بیل)ڕۆژی(٢٨ی ئابی ساڵی١٩٢١) روون تر دەردەکەوێ[٢٧]، لەو سەردەمە تا ئێستاش ژمارەی ئەستێرە زیاتر گوزارش لە ژمارەی ویلایەت و هەرێم دەکرد، هەروەك ئێستاش ژمارەی ئەستێرەکانی ئاڵای ئەمریکا ئەو گوزارشە دەکات.
خ- دەستووری ساڵی ١٩٥٨ لە ماددەی ٣ دووبارە داکۆکی کردەوە لە هاوبەشی هەردوو گەلی کورد و عەرەب.
د- جگە لە هەریەکە لە بەیانی ٢٩ی حوزەیران ورێکەوتنامەی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ یاسای ئۆتۆنۆمی ساڵی ١٩٧٤ و هەردوو دەستووری ئینتقالی و هەمیشەییەکەی ئێستا، لەگەڵ هەموو ئەو بریارانەی بەپێی بەندی حەوتەم دەرچوو لە نەتەوە یەکگرتووەکان، لە هەمووی گرنگ تر بۆ ئەو بەشە بریاری ٩٨٦ کە رێژەی ١٣٪ تایبەت لە خۆراك بۆ کوردستان دیاریکرا.

هەموو ئەوانە لەسەر بنچینەی عێراقێکی پێکهاتوو لە دوو نیشتمان و هەرێم و شێوەی فەرمی وەرگرتووە بە تایبەتی برگەی (د)ی ماددەی(١)ی(قانون الحکم الذاتي لمنطقة

کوردستان-١٩٧٤) مانای عێراقی بە هەمووان داوە، ئیتر ئەو جۆرە هەڵسەنگاندنە یاسایی نییە، کەواتە ئینتمای شارو شارۆچکە و دەڤەر بۆ هەرێمێکی وڵات یاساییە لە چوارچێوەی عێراق.

**٢- پاساوە مێژووییەکانیان:**

أ/ سەردەمی عەباسی: گوایە لەو سەردەمە ئەو ناوچانە سەر بە عێراق بوونە، بەهۆی بەغدا.. لە راستیدا وانییە لە سەردەمی عەباسی بەغدا پایتەختی عێراق نەبووە، بەڵکو پایتەختی عەباسی بووە، ئەگەر ئەوە پاساو بێت، ئەوا ئەنادۆڵ و شام و لوبنان و ئیسرائیل و میسر و... هەمووی عێراق بووە، ئەوکات ویلایەتی عێراق هەبووە، بەڵام دوا سنووری کەمێك سەرووی سامەڕا بوو، ئەوکات ئەو ناوچانەی کەرکوك وموسڵ سەر بە ئێقلیمی جزیرە و ویلایەتی شارەزوور بوون.

ب/ کە دەڵێن لە رێکەوتنی (شەریف- ماکماهۆن) لە کتێبی(دور ملك فیصل..ص١٤) هاتووە: (ان ولاية موصل الى ماردين و كوردستان جنوبية ضمن اتفاق ماكماهون - شريف)، راستی رێکەوتنامەکەی شەریف -ماکماهۆن لە هەردوو کتێبی:(الملل والنحل والأعراق ص٢٢٦)و (فورستر-نشأة الدولة العراقية ص٧٢) هاتووە، کە ئەوەی بەڵێن بە شەریف دراوە لە ساڵی ١٩١٥ راستییەکەی وانییە، چونکە لەدوای ئەو رێکەوتنە بە ساڵێك دابەشی رۆژهەڵاتی ناوەراست کرا بەپێی سایکس پیکۆ، تیایدا سنووری عێراق تا کەمێك سەرووی بەغدایە، ویلایەتی موسڵ درا بە فەرەنسا کە لایەك نەبووە لە رێکەوتنامەکەی شەریف ماکماهۆن، خۆ ئەگەر لەو رێکەوتنەش بەدەر بوایە عەرەب، نە یاسایی بوو نە شەرعی، چونکە ئەو رێکەوتنە نێودەوڵەتی نەبووە، ئەو دوو لایەش لە رێکەوتنەکە لایەنی رەسمی و یاسایی نەبووە، بە نهێنی و جەنتڵمانی رێکەوتنێکیان کردووەو تا ئێستا بەندەکانی دیار نییە.

سەرەرای ئەوەش پێدانی ئەو ناوچانە لە رێکەوتنەکە نەبووە، راستی ئەو پرسە بەو شێوەیەی خوارەوەیە:

دوای ئەوەی هەردوو حیزب (حیزبی فەتاتی عەرەبی و حیزبی عەهد) بەو رێکەوتنەی نێوان شەریف و ماکماهۆنیان زانی، لە٨ی ئاداری ساڵی١٩٢٠ کۆبوونەوەیەکیان لە دیمەشق کرد، پرۆژەیەکیان بۆ شەریفی مەکە (باوکی مەلیك فەیسەڵ) نووسی، تیایدا پێشنیاریان کردبوو ئەو حکومەتە عەرەبییەی دایدەمەزرێنێت لە مارسینیاو ئەدەنەوە تا هێڵی ٣٩و جەزیرە و ئامێدی و دیاربەکریش بگرێتەوە، شەریفیش ببێتە خەلیفەی موسڵمانان. ئەو پرۆژەیە بە (میساقی دیمەشق) ناوزەد دەکرێ، بەڵام ماکماهۆن ئەو پرۆژەیەی قەبوڵ نەکرد، وەك (براترام تۆماس) سنووری ئەو رێکەوتنەی ئاشکرا کردووە و دەڵێ لەلای سەروو رۆژهەڵاتی سووریا و خوارووی عێراق[28]، هەر ئەوەش بەرجەستە بوو لە سایکس پیکۆ..، ئەوە کەی دەبێتە بەڵگەو پاساو بۆ ئەوەی بڵێن کەرکوك عەرەبییە نەك لەرووی یاسایی هەتا لە رووی عەشایەریش نابێت.

پ/ کە دەڵێن ئەو ناوچانە بەشێك بوون لە ویلایەتی موسڵ کە لە ساڵی ١٩٢٥ (عوسبە) بە عێراقی دا.. ئەگەر ئەوە پاساو بێت ئەوا وەك خاڵی یەکەم هەر ئەوەیە هەموو کوردستانی باشووری ئێستا لەو کێشەیەی ویلایەتی موسڵ بووە، ئینجا ئەو لیژنەیە بریاری دا کە ئەو ناوچەیە کوردستانییەو لەو ناوچەیە ناوی عێراقیان هەر نەبیستبوو بەپێی راپۆرتی لیژنەکە رۆژێك لە رۆژان سنووری عێراقی عەرەبی نەگەیشتووەتە ئەو ناوچەیە، سەرەرای ئەوەش هەموو لایەك دەزانێ ئەگەر بەریتانیا نەبوایە ئەو ویلایەتە لەژێر دەستی تورکیا دەبوو.

ج/ کە دەڵێن لە سەردەمی ویلایەتی موسڵ بەو بەشەشییەوە خرایە سەر بەغدا، ئەگەر واشبێت وەك برگەی (ج) گرنگییەکی یاسایی و سیاسی نییە، سەرەرای ئەوەش وەك لە (پرۆگرامی خوێندنی باڵای عێراق) هاتووە مەدحت پاشا والی عێراق بووە، ئەوە هەڵەی زانستییە، بەڵکو تەنها والی ولایەتی بەغدا بووە کە پێکهاتبوو لە(١١) قەزا، ئەوەش سنووری ئیداری ویلایەتی بەغدا بووە: کازمییە، عەزیزیە، عانە، دلێم، کووت، ئەلجەزیرە (مەبەستی ئەو جەزیرەی رۆژهەڵاتی سامرایە)، مەندەلی، خانەقین، بەدرە، جەسان، سامەڕا، . . ئەوەش هەمان سنووری سەرووی ویلایەتی عێراق بووە لە سەردەمی عەباسی، ئەگەر لەو سەردەمی ویلایەتی موسڵ خرابێتە سەر بەغدا بە پاساوی عەرەبی بوونی ناوچەیەکە بێت، ئەوا جاریش وابووە بەغدا خراوەتە سەر ویلایەتی موسڵ، یاخود جار وابووە ویلایەتی بەغدا خراوەتە سەر کوردستان (وەك لە سەردەمی عەبدولرەحمان بابان) دەبێ بڵێی بەغداو دەورووبەری کوردستانین؟.

ت/ کە دەڵێن خۆ کەرکوك شارێکی کوردی نییە.. بۆیە عێراقییە، لە راستیدا بە دەگمەن شارو وڵاتێك دەبینی بتوانرێ ناسنامەی رەگەزێکی دیاریکراوی پێبدرێ، لەو رووەوە کورد زیرەك بووە لە گەڵاڵەکردن و چارەسەرکردنی ئەو خاڵە نەیان وتووە کەرکوك و ناوچە ناکۆکەکان کوردین، بەڵکو وتوویانە کوردستانییە، کاتی خۆشی کە ووتراوە موسڵ کوردستانییە یان کەرکوك نەووتراوە کوردیە هەروەك لە(قاموس الاعلام) ی عوسمانی لە (ماددەی ویلایەتی موسڵ) وا هاتووە: خەڵکەکەی زۆری عەرەبن، بەڵام هەرێمەکە پارچەیەکە لە کوردستان.

خۆ هەولێر و دهۆك و زۆربەی شارەکانی کوردستانی و بەغداو موسڵ و زۆربەی شارەکانی عێراق پێکهاتوون لە رەگەز و تایفەی جیاجیا، تەنانەت لە بەغدا جوولەکەی ئەوەندە زۆربوو پشوو ببووە شەمە، ئەو حاڵەتە ناسنامەی نیشتمانی لێ ناکوژێتەوە، بوونی تورکمان لە کەرکوك و ناوچە دابراوەکان دەکەینە برگەیەکی سەربەخۆ.

لە ئاماری ساڵی١٩٥٧یش (لەگەڵ تەعریبیش) کەچی ئەوە ئامارەکەیە: کورد٣ر٤٨٪، ٢ر٢٨٪عەرەب، ٥ر٢١٪تورکمان، نەك ئەوەی برایانی عەرەب دەڵێن کورد زۆرایەتی نەبووەو بە ٣\١١یان لە قەڵەم داوە.

بوونی تورکمان و ئاشووری و عەرەب لەو ناوچەیە حاشا هەڵنەگرە، زیاتر لەوە لە تەواوی ئەو ناوچەیەی ئێستا پێی دەوترێ عێراق تورکمانی لێبووە، بەڵام ئەو سیاسەتە

شۆڤێنی و خێڵەکی وایکرد ئەوانە زۆر کەم ببنەوە، تەنها لە ناوچەکانی کوردستان ماونەوە. ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ و بەڵگەنامەکانی بەریتانی و زۆر بەڵگەنامەی نێودەوڵەتی ئەو ڕاستییە دووپات دەکەنەوە.

مێژووی تورکمان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سوپایەی عەباسییەکان هێنایان لەلای چین و تۆران، دوایی لەگەڵ شەپۆلەکانی مەغۆل و سەلجوق و سەفەوی بە مەڕ و ماڵاتەوە دەهاتن، لەلای فارسیش یەکەم جار نادرشا لەنێوان ساڵانی (١٧٣٣–١٧٤٣) قزلباشی (کڵاوە سوورەکان) بەسەر کوردستان وەرکرد، کەواتە ماوەیەکی دوروودرێژە هاتوونەتە کوردستان بەلای کەمەوە (٥) سەدە دەبێت، ئیتر ئەوانە ماف تەواویان هەیە لەو وڵاتە، نابێ بە چاوی نامۆو موالی سەیریان بکرێت، ڕایەکی چەوت و شۆڤێنیانە لەلایەن هەندێ کورد هەیەو هەبووە، دەڵێن تورکمان ئەو کوردانە بوونە کە پیاوی تورك بوونە لە سەردەمی عوسمانی، گوایە ناوەکەشی لەوە هاتووە[٢٩]، نەخێر تورکمان و تورك و قیرغیز و ئۆزبەك و تاجیك و ئازەر.. لقەکانی تۆرانین کە لە بنەچەدا بە زمانی (توکی یو) قسەیان کردووە، تورکمانی کوردستان ئەوەندە پەیوەندیشیان لەگەڵ عوسمانی باش نەبوو، لە شەڕەکانی سەفەوی و عوسمانی ئەوان لای سەفەوی بوون (جگە لە تەلەعفەر)، پەیوەندی عوسمانی بە ڕەگەزی تورك بە هێز نەبووە ئەگەر لاوازیش نەبووبێ، ئەوە لە دەستووری عوسمانی(مەشروتییە) ڕەنگی دابۆوە، لە ماددەی (٧١)ی هاتبوو: کە ئەندامانی پەرلەمان (مەبعوسان) نوێنەرایەتی ویلایەتێك و چینێك و ڕەگەزێك ناکەن، کەواتە ئەو ناوچانەی لە کوردستان ناوی تورکیان لێیە وەك قەرەداخ، قەرەچوخ، قوشتەپە، . .. ئەوە بە تورك کردنی ناوی کوردی نەبووە لە سەردەمی عوسمانی[٣٠]، بەڵکو ئەوە زیاتر مەردارەکانی تورك بوونە ئەو ناوانەیان لەو ناوچانە ناوە. کاریگەری عوسمانی بەسەر تورکمانی کوردستان لەپاش ئینقلابە ڕەگەزپەرستییەکەی ساڵی ١٩٠٨ی ئیتحادو ئەلتەرەقی دەستپێدەکات، هەر یەکەم پرۆسەی بەتورك کردنیش بەپێی (تۆما بوا) لە کتێبی (تأریخ الاکراد) لەسەر دەستی (ئەنوەر پاشا) دەستی پێکرد، بەپێی نووسراوی فەرمی ومەرکەزی کەمێك پاش ئەو یەکەم پرۆسەی بەتورك کردن لەلایەن ئیتیحاد ئەلتەرەقی کراوە، لە سەردەمی ئەتاتورکیش لە ساڵی ١٩٢٣بەپێی بڕیاری حکومی ژ:١٥٠٥زەوییەکانی شێخ و سەرۆکەکان سترێنرانەوە بۆ مهاجیرە تورکەکان[٣١].

ئیترلەدوای ئەو بەرواره (واتەلەکۆتایی سەدەی ١٩) گەلێ جار لەلایەن گەریدەو ئینسکلۆپیدیا و ئاماری تری نافەرمی ناوی تورکمان شان بەشانی کورد هاتووە لە کەرکوك، هەندێ جار زیاتریش، ئەوە لەڕووی ئینتیمای کۆمەڵایەتییەوە، نابێ کورد نکوڵی لەو ڕاستیانە بکا، بەڵام پرسیاری بنچینەیی ئەوەیە ئەو شارە (یا ئەو ناوچەیە) ئینتیمانی نیشتمانی چییە؟ لەڕووی یاساییش ئینیتمای ئیقلیمی چییە؟.. ئەوەش حاشا هەڵنەگرە کە هیچ نیشتمان و هەرێمێك بەناوی عەرەبی یان تورکمانی یان هەر ناوێکی تر لە دوورو نزیکی ئەو ناوچەیە نەبووە تا ئینتیمای بۆ ئەو بگەڕێتەوە[٣٢]، جگە لە کوردستان نەبێت، کە بە ناوی جیاجیای وەك شارەزوورو بلاد الاکراد واقليم الجبال واقليم الجزيرة..ناوی هاتووە، کوردستانیش تەنها موڵکی کورد نییە، موڵکی تورکمان و ئاشووری و لایەنی تریشە، بۆیە زۆر ئاساییە هەروەك هەرمۆتەو عەنکاوە شارێکی زۆرایەتی مەسیحیە کەچی کوردستانییە، کەرکوك هەرچی بێت کوردستانییە، ناوی کوردستانیش وەك تورکیا نییە لە سەردەمی ڕابوونی نەتەوەیی (لە سەرەتای سەدەی بیستەم) سەریهەڵدابێ بە بڕیار و مەرسوم، بەڵکو زیاتر لە (٨) سەدەیە ئەو ناوە هەیە، واتە گوزارش لە پرۆسەیەکی مێژوویی قووڵی چالاکی سیاسی و کۆمەڵایەتی کورد دەکا لەو ناوچەیە.

*** پاساوەکانی تورکمانیایەتی ئەو ناوچە :-**

دوای ئەوەی برایانی تورکمان هەستیان کرد کێشمەکێشێك لە بارەی ناسنامەی کەرکوك وادرێژە دەکێشێ بێ ئەوەی حیسابێکی وایان بۆ بکرێ، بەتایبەتی لە قۆناغی نوێدا، ئەوانیش بە خۆکەوتن و بەدوای بەڵگەی مێژوویی و جوگرافی و سیاسی و یاسایی گەڕان تا لەو تەپوتۆزە بزر نەبن، واتە تاڕادەیەك کاردانەوە بووە پێش ئەوەی قەناعەت بێت، چونکە لە مێژوودا ئەو تەقەلایەیان کەمتر بەدی دەکرێ، ئێستاش ئەوەی لێیان بەدی دەکرێ دەزانن چیان ناوێ، نایانەوێ کەرکوك و ئەو ناوچەیە ببێتەوە هەرێمی کوردستان، بەڵام نازانن چیان دەوێ، بۆیە پرۆژەو ووزەیان زیاتر دەچۆرێتە دەریاچەی پرۆژەی ڕەگەزپەرستی عروبی، لە سەر ئەو بنچینەیە پاساو و بۆچوونی برایانی تورکمان دوو بەشە: یەکەمیان کە زۆرایەتییە و زیاتر داکۆکی لەوە دەکەن کە کەرکوك و ئەو ناوچەیە عێراقی بێت کە زیاتر گوزارش لە بۆچوونی دەسەڵاتدارانی ناوچەکە دەکات، ئەوەش زانستێکی وای ناوێت وشتێکی لە پاساوی عروبییەکانی سونە زیاتر نییە کە لە پێشوو تر وەڵاممان دانەوە. دووەمیان کەمایەتین، داکۆکی لەوە دەکەن کە ئەو ناوچەیە تورکمانییە، ئەوەش گوزارشێکی نەرێنی نییە، نابێ کورد بەوە پەست بێت، دەبێ ئاسایی بێت ئەگەر بەڵگەی مێژوویی و یاسایی ڕەوایان دۆزییەوە، ئینجا ئەگەر لە ڕاپرسییەکی سروشتی دەرکەوت ئەوان زۆرایەتین لە تەواوی ناوچەکە و خەڵکی ئەوانی ویست دەبێ کورد لە پێش عەرەب پیرۆزباییان لێبکاو پشتگیریی لەسەرەنجامی یاسایی و سیاسییەکەی بکرێت، بەو شێوەیە دەچینە نێو پاساوەکانیان کە لە توێژینەوەی پەرت وبڵاو کۆمان کردووەتەوە و بە کورتی و پوختی:

١– دەڵێن تورکمان کۆنترین میللەتن لەعێراق، لەوە پاڵپشتیان کردووەتە سەر توێژینەوەیەکی (ئۆپیرت) کە دەڵێ سۆمەر هیچ پەیوەندییەکی بە زاراوەی ئەو ساو ئێستای جزیرەی عەرەب نییە، هەروەها ڕای (قلقشندی)دەڵێت تورکمان ٨سەدە پێش زایین لەو ناوچەیە هەبوونە. کەواتە بەڕای تورکمان ڕەچەڵەکی سۆمەرییەکان تورکن کە ٣٠٠٠پ ز هاتوون ئەو ناوچەیەیان ئاوەدان کردووەتەوە، چونکە ئەوان (واتە باپیرە گەورەی تورکمان شارستان و ئەهلی کارو چاوکراوە بوونە، دەڵێن تورکمان لە هەموو عێراق بە چڕی هەبوونە، شارەکانی

واسیت و حیلەو بەغداو بەدرەو زورباتییە و خانەقین وکفری و قەرەتەپە.. ئەوان دروستیان کردووە، زۆربەی گەرەکی شارەکانی بەسرەو بەغداو و سامەراو موسڵ تورکمانی بووە، لە سەدەی ١١ەوە ناوی تورکمانیان لێنراوە، دەسەڵاتی تورکمانیش نموونەی هەیە لەو ناوچانە لەوانە دەسەڵاتی (زين الدين كچك لە هەولێر، ئیواقیە لە (جبل حەمرین)[٣٣].

٢- (مێجەرسۆن) لە(رحلة متنكر الى بلاد ما بين النهرين ص١٥٨) دەڵێت (تشتهر كركوك بتركمانها وفواكهها ونفطها.. وسكانها يتكلمون التركية)، هەروەها لۆنگرینك لە. (اربعة قرون من تأريخ العراق الحديث) ساڵی ١٩٢٥ ئەویش دووپاتی زۆرایەتی بوونی تورکمان لە تەوەری تەلەعفەر موسڵ هەولێر کەرکوک کردووەتەوە.(حنا بەتاتۆ) لە کتێبی (العراق ج٣ص٢٢٤) بەروونی دەڵێ کەرکوک شارێکی تورکمانییە.

٣- دەڵێن لەسەر بنچینەی رەگەزی تورکمانی لەکەرکوک دەنگ بە عێراقی نەبوونی ویلایەتی موسڵ درا.

٤-لە بەڵێننامەی(٩)ی)١٠بەڵێننامەکەی رۆژی٢٨ی کانون دووەمی ساڵی١٩٣٢تیایدا هاتووە کە زۆرایەتی ناوچەی کەرکوک تورکمانن بۆیە لەوێ زمانی تورکی دەبێ فەرمی بێت.

٥- دەڵێن لە ساڵی ١١٦٢ك بەرامبەر١٧٤٩ز تورکمانەکانی کەرکوک رارەوی کاسۆلیکیان وەرگرت و بوونە کلدان، ئەوانە لەگەڵ کلدانی ئەسڵی عێراق جیان، بەڵکو لە رەچەڵەکدا دەگەرێنەوە بۆ خێڵەکانی(ئۆغوز)ی تورک. واتە کلدانی کەرکوک ئاینیان جیایە، بەڵام رەگەزیان تورکمانە[٣٤].

٦- لە توێژینەوەیەکی(العميد المتقاعد ياوز نورالدين صابر اغائوغلو) دەڵێت: کەرکوک کوردستانی نییە بە بەڵگەی ئەوەی کە یەکەم کابینەی حکومەتی عێراق دروست بوو لە ساڵی ١٩٢١ یەك وەزیری کورد لەو حکومەتە نەبوو، بەڵام وەزیرێکی تورکمان لە کەرکوک هەبوو، لە هەندێ توێژینەوەی تریان باس لە ئاماری فەرمان بەران وخوێند کاران دەکات و دەڵێن تورکمان زیاتر بووە لە کوردان.

*** کورتە هەڵسەنگاندنێك:-**

بۆ ئەوەی توێژینەوەکە بێ لایەن بێت پاساوی هەموو لایەك بڵاودەکەینەوە، وەڵامی بۆچوونی هەڵەش نادەینەوە، بەڵام نابێ هەڵە زانستییەکانی هیچ لایەکمان بەسەر دا تێپەری، لەسەرئەو بنچینەیە، هەندێ هەڵەی زانستی لەو پاساوانەی برایانی تورکمان راست دەکەینەوە:

١-راستە تورکمان لە هەموو عێراق هەبوو، بەڵام ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین دەبینین تەنها لەو ناوچانە ماون کە کوردستانین، کەواتە چارەنووسی تورکمان زیاتر بەندە بەو داوا رەوایەی دژبە تەعریب و باڵادەست کردنی رەگەزێك بەسەر رەگەزێکی تر کە لەلایەن مەدرەسە مرۆیی و تەواوی ئاینەکان حەرام کراوە.

٢-ئەوەی تا ئێستا ئاشکرا بێت هەرسێ لایەن (عەرەب و تورکمان و کورد) سۆمەری بە باپیرە گەورەی خۆیان هەژماردەکەن، کەچی نەوەی خۆیان ماون جیان لە هەرسێ لا، بریا ئەو یەك باپیرییە وای لەو نەتەوانە بکردبایە گیانی هاریکاری و لێبوردەیی و برایەتی بۆ دروست بکردبانایە، بەڵام وا نابینرێ هەریەکە دەیەوێ خۆی زاڵ بکات بە بچووککردنەوەی ئەوی تر.

٣-ئینجا دەڵێن چونکە سۆمەری باپیرانی تورکمان شارستان وئەهلی شارو پێشەدار بوونە، (سەنعان ئەحمەد ئاغا قەساب) لە توێژینەوەیەکی تر لە بارەی لێك جیاکردنەوەی کورد و تورکمان لە هەولێر بەو ڤاکتەرە لێك کردووەتەوە گوایە کرمانج (کورد)پیس و چڵکن بووە، ئەو رایە دەگەرێتەوە بۆ فەرهەنگی رەگەزپەرستی ئیتحاد ئەلتەرەقی کە ناوی لە عەرەب نا(پیس عەرەب)..کەچی یاقوت حەمەوی لە(معجم البلدان ج١-اقليم السبع) دەڵێت تورك وەك درندە بووە بە(وحش الجبال)وەسفیان دەکا، کلیمنسۆری سەرۆکی فەرەنسا لە کۆنگرەی ئاشتی باسی لەوە کرد کە تورك (نقص الكفاءة)ی هەیە ناتوانێ میللەتی تری لەژێر دەست دابێ، ئەوە بووە بنچینەی یاسایی رێکەوتنی سیڤەر بەتایبەتی ماددەی(١٣٢)ی ئەو رێکەوتنە، لە راپۆرتی ویلایەتی موسڵیش تورکمانی ناوچەی ویلایەتی موسڵ بە (مرتزقة العباسية) باس دەکات[٣٥]، لە شوێنێکی تر دەڵێت لەنێو عوسمانی کە ناوی تورك دەهات وەك گەمژە و غەشیم(همجی) سەیر دەکرا تا ساڵی ١٩٠٠ لەسەر دەستی (بزووتنەوەی عموم الترك) بوونە جێی شانازی[٣٦]، تەنانەت لەسەردەمی عوسمانیش کە حوکمەکە تورکی بووە کەچی هەرناوی تورك هاتبێ هاوتای (اعراب-بی ئیدراك)[٣٧] بووە-لە بارەی وەسفی (بی ئیدراکی تورك) بروانە:- (ساطع الحصري -محاضرات في نشوء القومية) و(دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة - د.عثمان علي ")، ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە دەستووری عوسمانی(مشروطية) دەبینین پێکهاتووە لە ١١٩ماددە (کە دەکاتە٤٣٦٨ووشە)بە هیچ ووشەیەك ناوی تورك نەهاتووە، ئەوە مێژوە ئەگینا لای هەموو لایەك دەبێ وەك برا سەیری یەك بکەین کەسمان لە کەس گەورەو نەجیب تر نین.

٤- ئەگەر دەڵێن مێجەرسۆن و لۆنگرینك و حەنا بەتاتو ووتویانە کەرکوك تورکمانییە.. دوای ووردبوونەوە بەو شێوەیان نەووتوە هەریەکە لەوانە لە شوێنی تر کوردستانی بوونی کەرکوکیان بەیان کردووە، حنا بەتاتۆ لە (العراق ج٣ص٢٢٤) وای وتبێ لە (ج٢ العراق ص٤٥١) دەڵێ نیوەی کەرکوك کوردن ئەویتریش تورکمان و عەرەب و مەسیحین، لە موعجەم و گەریدەو ئامارەکان ناوی تورکمان لە کەرکوك نادۆزییەوە تا نزیك سەدەی بیستەم، یان بە ووردتر دوای ئینقلابی ئیتحاد و ئەلتەرەقی لە ساڵی ١٩٠٨ کە تەقەلای دا ژێر دەستی عوسمانی بە تورك بکاو ئەوەی تورکی نەزانیبایەو نەیوتبوایە من تورکم ئەوا دەردەکرا لە فەرمانبەری، هەر بۆیەش دەبینین لە خودی پانۆرامای رووداوەکانی کەرکوك کە لە (احداث ووقائع كركوك من ١٧٠٠ الى ١٩٥٨)کە لەلایەن تورکمان نووسراوەتەوەو هەوڵیداوە جموجۆڵی سیاسی کوردو خەڵکی تر بشارێتەوە.. کەچی تادوای ئەو بەروارەی سەروو نەیتوانیوە یەك نموونە بدۆزێتەوە باس لە بوونی تورکمان بکا، با بروانینە ئەو گەریدانەی هاتوونەتە کەرکوك کە

بەشێكیان لەو كتێبەش تۆمار كراوە: لیۆناردۆ راڵف لە ساڵی ١٥٧٤، میرزا ئەبو تالیب-هیندي (رحلات في آسيا واوروبا وافريقا-١٧٧٩)، جاكسۆن لە كتێبی(مشاهدات بريطاني لمسيبوتاميا-١٧٩٧)، نۆرین دۆپرییەی فەرەنسی(رحله من ايران-١٨٠٧)، جیمس بینگام (رحلات في بلاد مابين النهرين-١٨١٦)رۆبەرت كیربۆرتەر(رحلات في جورجياوايران وارمينيا-١٨١٨)، جیمس ریچ لە ساڵی١٨٢٠، ج شیل لە١٨٣٦، كارل ریتر لە ١٨٤٤، مافرینز لە١٨٩٢، تا دەگاتە مارك سایكس (سفرة في ولايات الخمسة التركية-١٨٩٩)، فون هامری نەمساوی لە (تأريخ الدولة العثمانية)[٣٨]...باسی توركمان لە كەركوك ناكەن.

یەكەم كەس مێجەر سۆن باسی توركمانی كردووە لە ساڵی ئینقلابەكە ١٩٠٨ هاتووەتە ئەو ناوچەیە و كتێبی (رحلەمتنكره الى ميزوپوتاميا) نووسیوە، ئەویش بەنەرێنی بووە، ئەو ناڵێ توركن وەك لە پاساوی برا توركمانەكان هاتووە، دەڵێ پیاوی توركن (تورك +مان بە ئینگلیزییەكەی ئەو مانایە دەدا) مەبەستی فەرمانبەران بووە، بەو كوردانەی دەوت كە پیاوی عوسمانین[٣٩]، لەو كاتی ئەو تێروانینە دروست ببوو هەر مێجەرسۆن وای نەووتوە، ئەوەتا رۆژهەڵاتناسی جۆرجی (ئەلبرت مينشا شفيلی) دەڵێت:((جزءاً من العوائل الارستقراطية المتنفذة في كركوك من اصول كردية رغم انها تسمي تركية ومن بينها النفطجية واليعقوبيين والقيردار وغيرهم الذين ينتمون الى عشيرة زنكنة الكردية، وكثيرا ماكان الكرد يطلقون لفظة الترك على الموظفين المدنيين والعسكريين وابناءالاستقراطيةالكركوكية)[٤٠]بەو پێیە شانازی نییە بۆ برا توركمانەكان كە (توركمان بریتی بن لە:كوردی پیاوی تورك)، لە بیریشمان نەچێ مێجەرسۆن لە شوێنی تر دەڵێ كەركوك كوردستانییە، ئەوە نیفاق نییە بەڵكو مەتەڵەكە لەو تێروانینە بە هەڵەیەی سەروو دێت.

٥- لە بارەی راپرسییەكە بۆ مەلیك فەیسەڵ دەنگ نەدانی كەركوك بۆ عێراق وەك بووەتە پاساوی توركمانییەتی ئەو شارە و لەگەڵ راپرسییەكەی ویلایەتی موسڵ تێكەڵ كراوە، كەركوك بەرامبەر مەلیك فەیسەڵ دەنگی نەدا، هەڵوێستێكی جوانی توركمانە، لە هەموو سلێمانی دەنگ بۆ مەلیك فەیسەڵ و عێراق ٣٢دەنگ بوو، لە كەركوكیش تەنها ٦٤دەنگی هەبوو١٩٧دەنگیش بە مەرجی ماف بۆ كورد.

مس بێل (لە نامەی رۆژی ١٤ی ئابی ساڵی١٩٢١ بۆ بەریتانیا) ئەو پرسەی بە جوانی روون كردووەتەوە دەڵێ: زۆربەی ناو كەركوك توركمانن و گوندەكانی دەورووبەریش هەمووی كوردن، هەردوولا داوای دەوڵەتێكی كوردیان كرد لەژێر چاودێری ئێمە، تەنها دوو گەرەك لەناو كەركوك داوای گەرانەوەی عوسمانییان كرد[٤١].

٦- لە بارەی بەڵێننامەی ژ:٩ - لەسەر داوای كورد بوو دوای ئەو هەموو شەرو شۆرەی كە بە خۆپێشاندانی بەر دەرگای سەرای سلێمانی بەناوبانگە، بەڵێننامەكان لەلایەن لیژنەیەك نووسرایەوە لە ١٩ی مایس ساڵی١٩٣٢ پێكهاتبوو لە: ١- داود حەیدەری - سەرۆك (كورد) ٢- غەیاسەدین نەقشبەندی -جێگر(كورد) ٣-عەبدولجەبار ئەلتەكەرلی - بریاردەر، سەبارەت بە وەرگیرانی عێراق بوو لە (عصبة الأمم) پێكهاتبوو لە ١٠بەڵێننامە كە عێراق پێشێلی نەكا و ئاگای لە كوردو كەمایەتییەكانی تر بێت.

لە بەڵێننامەی ژمارە (٩) هەم لە عەرەبییەكەو هەم لە ئینگلیزییەكەی بەووردی لێمان تۆیژیەوە ئاوا نییە وەك لەپاساوی برایانی توركمان هاتووە، خۆی ٣ برگەیە، لە برگەی (١) و(٢) و باسی هەر چوار لیوای كورد (موسڵ، هەولێر، كەركوك، سلێمانی) كە دەبێ رەچاوی مافیان لە زمان و فەرهەنگ و ئیدارە دەكا، ئینجا دێتە سەر ئەو ناوچانەی لە كوردستان توركمانی لێیە وەك كفری و كەركوك دەڵێ شان بەشانی كوردی و عەرەبی زمانی توركیشی لێ فەرمی بێت ئەگەر زۆرایەتی بوون، لە ماددەی (١٠)ش باس لە پێشێل نەكردنی دەكا.

٧- لە بارەی ئەوەی كە كەركوك كوردستانی نییە چونكە لەیەكەم كابینەی حكومەتی عێراقی هیچ وەزیری كوردی تێدا نەبووە و وەزیرێكی توركمانی تێدا بووە، لیستێكی ناوی وەزیرەكانیشی بڵاوكردووەتەوە تیایدا دوو وەزیری كوردی تێدایە(جەعفەر عەسكەری وحەمدی بابان) دیارە نەیزانیوە ئەوانە كوردن، سەرەرای ئەوەش راست دەكا كورد بەشدار نەبووە، وا دیارە نووسەر بێ ئاگا بووە لەوەی كە ئەو كاتی عێراق تەنها لە ویلایەتی بەسرەو بەغدا پێكهاتبوو، خۆكێشەی ویلایەتی موسڵ چارەسەر نەكرابوو، ئینجا كورد خەریكی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی بوو بەپێی رێكەوتنامەی سیڤەر و ئاواش بۆ لیژنەكەی كۆنگرەی قاهیرەی ساڵی ١٩٢١ بەجێما، هەرئاواش لەلایەن بەریتانییەكان وەڵامی لایەنی توركی دراوە لە كێشەكەی موسڵ ووتیان لەكاتی دروستكردنی حكومەتی عێراقی، كوردستان بەپێی ماددەی ٦٤ چاوەرێی بە دەوڵەت بوونی دەكرد[٤٢]، كەواتە كورد بەشدار نەبوون لە یەكەم كابینەی حكومەت، هەروەك لە راپرسییەكەی مەلیك فەیسەڵیش لە كەركوك و سلێمانی و هەولێر بەشدار نەبوون یان دەنگیان پێنەدا.

لە بارەی زۆری خوێندكارو فەرمانبەرانی توركمان ئاساییەو هۆیەكەمان باس كرد، ئێمە لەو توێژینەوەیە ئەوەندە كێشەمان لەگەڵ زۆر و كەمی توركمان لە ناو كەركوك نییە، كەس ناڵێ كەركوك كوردن دەڵێن كوردستانییە، سەرەرای ئەوەش ئەگەر ئێوەی برا توركمان ئەو جۆرە ئامارانە بەكاردەهێنن ئەوا برایانی كوردیش دەستكورت نین لەو روەوە، ئەوەتا بەڵگەنامەیەكی بەریتانی لەلایەن (د. كەمال مەزهەر)ەوە بە پێچەوانەی ئێوە پێشان دەدا، دەڵێ كاتی بەریتانیا كەركوكی داگیر كرد ئەنجوومەنێكی حوكمی (١٢) كەسی لە لەپێكهاتەكانی كەركوك دروست كرد بەو شێوەیە: كورد٦كەس، توركمان ٣، وعەرەب ١، مەسیحی ١كەس، جوولەكە ١كەس[٤٣].

٨- لە بارەی بوونی حكومەتێكی توركمانی بە رابەرایەتی (زين الدين كچك)...، ئەو پیاوە باوكی سوڵتان موزەفەری زاوای سەلاحەددینی ئەیوبییە، بە پێچەوانە لە راپۆرتی ویلایەتی موسڵ ص١٠٥ دەڵێ توركمان لە مێژوودا هیچ ناوچە و ئیقلیمێكیان نییەو نەبووە بەناوی ئەوان بێت،

مەگەر كەمێك بەیات، تەنانەت عەشیرەتێكیشمان نەبینی بەناوی توركمان، .. ئینجا لە ص١٩٨-١٩٩ لەلایەن لیژنەكە ئاماری سلێمانی و هەولێرو كەركوك بلاوكراوەتەوە توركمان بەو شێوەیە: لەكەركوك٢٦٪ لە هەولێر٣٪. لە ص٢٢٣لە (استنتاج عامە) دەڵێ زۆر بە ووردی لە ویلایەتی موسڵ وكەركوك وخوارووشی تەنها دوو رەگەزی سەرەكی بەدی دەكرێ كوردو عەرەب ئەوانی تر پەرت وبلاون ولە شێوەی پێكهاتە نین.

لە راستیدا كێشەی بنچینەی ئێستای توركمان لەوە دێت كە ئەوان هەرێمێكیان نییە ئەگەر بچووكیش بێت، تا بەپێی یاسای نێودەوڵەتی و دەستوور مافەكانی چارەنووس (لە ئۆتۆنۆمی یان فیدرالی یان هەر ئیدارەیەكی سەربەخۆ) بیانگرێتەوە، نابێ كورد لە كاردانەوەی ئەوان دەمارگیر بێت بەرامبەر ئەو داوایەیان ئەگەر هەرێمێك دروست بێت وەك خۆیان دەڵێن چ لە موسڵ یان لە كەركوك و ناوچەی بەیات بەهۆی راپرسی دەركەوت ئەوان زۆرایەتین و دەیانەوێ هەرێمێك پێك بهێنن یارمەتی بدرێن (لایجرمنكم شنآن قوم علی ان لاتعدلو...)، ئەگەریش زۆرایەتی نەبوون ئەوا ئەوانیش دەبێ روو لە بینا كردنی برایەتی و(هاوولاتی بوونی دەستووری) بكەن لە كوردستان، چونكە لە مێژووی نوێ وا دەبینین هەر كاتێ كورد دەسەلاتێكی بە خوێن و فرمێسك و ئارەقە پەیداكردبێت ئەوا یەكسەر برایانی توركمانیش بارودۆخیان باش بووە، پێچەوانەشی بە پێچەوانە، وا پێدەچی ئەوانەی خۆیان كردووەتە نوێنەری توركمان ئەوەندە شارەزاش نەبن یاخود بەهۆی تر نەیانەوێ بە دروستی كار لەپێناوی بەرژەوەندی توركمان بكەن، وەك پێشنیارێك لە بەشی(البراهین التأریخیە) لە راپۆرتی ویلایەتی موسڵ ص١٥٧ باسی هەرێمێكی فراوان لەنێوان بەغداو موسڵ دەكا دەڵێ: ئەو ناوچەیە پێی ووتراوە تەتەرستان كە یەك رەگەزن لەگەڵ توركمان بۆیە وا چاكە ئەوان بە دوای زێدێك بگەرێن، بەلام بە دەست بەسەراگرتن نەبێت (وەك ئیسرائیل یان تەعریبی برایانی عەرەبمان) بە خواستی دانیشتووانی ناوچەكە بێت.

٩- ئەوەی هەموو بەڵگەو تەقەلای برایانی توركمان لاواز دەكا ئەوەیە تا ئەو ساتە بەڵگە و سكالایەك نادۆزییەوە لە ئەرشیڤی عێراقی یان بەریتانی یان عوسمانی یان فەرەنسی یان بەڵگەنامەیەك (وەسفی پێناسی بەڵگەنامە هەڵگری) تیایدا داوای كەركوك یان هەرێمێكیان لەو عێراقە كردبێ، یان شۆرش و راپەرینێكیان بۆ كردبێ، تەنها لەو كاتانە كە كورد داوا دەكەن ئەوانیش بە شێوەیەكی وا داوا دەكەن گومانی لی بكرێ، چونكە ئەوان داوا لە عێراق ناكەن داوا لە كورد دەكەن بۆیەش بە ئەجندای دەرەكی تۆمەتبار دەكرێن.

*** كوردستانی بوونی ناوچە (دابرێنراوەكان):-**

پێش ئەوەی كە بە كەڵلەرەقانە بڵێین ئەو ناوچانە كوردستانین، با بزانین دەشێ بڵێین سەر بە هەرێمی ترن؟ ئایا هیچ هەرێمێك لەو ناوچەیە نەبووە؟ هەریەكە لە ناوەكانی كۆنی وەك (بلاد بابل، بلاد ئاشوور، سومر، عێراق ئەلعەرەبی، سواد، میزۆپۆتامیا، بلاد رافدین، بلاد مابین النهرین، دیرە، مونتەفیك، عراقی عەجەمی، كوردستان، ئیقلیم الجبال، . ..) دەبینین ئەو ناوچانە لەوانە نزیكە كە كوردستانیان لێ دروست بوو، وەك میزۆپۆتامیا، جزیرە، عێراقی عەجەمی، اقلیم الجبال...، بەلام هەرگیز دوور و نزیك پەیوەندی (ناوچە ناكۆكەكان) بە (بلاد بابل، اشور، سومر، سەواد، عێراق ئەلعەرەبی، مونتەفیك) نەبووە، كەواتە كێشەی ناوچە ناكۆكەكان لەسەر ئەوە نییە ئاخۆ عەرەبستانە یان كوردستانییە، بەڵكو عێراق خۆی بووەتە (تەرەف)، وەك ئەوە وابێت لەنێوان دوو دەوڵەت بووبێت، ئەوەش جێی سەرسامی بیانییەكانە كە یەكەم جار دێنە عێراق و سەیری ئەو كێشەیە دەكەن دەڵێن ئەوە ئاسایی نییە، خۆ كوردستان دەوڵەتێكی تر نییە ئەو كێشەیەی لەگەڵ عێراق هەبێت و ناوی (المناطق المتنازع علیها) هەڵگری، ئەوەیان راستە ئەگەر ئەو دپلۆماسیە بیانییانە بەتایبەتی UN شارەزا نەبن، ئەو سەرسامییە كورد دروستی نەكردووە، خودی حكومەتەكانی عێراقی دروستیان كردووە، لە مەركەزەوە نەك لە هەرێمەكانەوە، واتە ئەو زوڵم و زۆرەی لەو ناوچانە كراوە (هەرێمێك لەناو عێراق) پێی هەڵنەستاوە بەڵكو خودی مەركەز (بەغدا) پێی هەڵساوە، بە تەعریب كردنی بە گۆرینی دیمۆگرافیای ناوچەكە، بەناو گۆرینی بە نەقل كردن و گواستنەوەی شار بۆ شار.. بە كۆمەڵێك تەقەلای كۆمەلایەتی و سیاسی و یاسایی و ئیداری و سەربازییانە، مەبەست ئەوە بووە كۆتایی بەوە بێنێت كە ئەو ناوچەیە ناوی كوردستانی هەڵگرێت، هەر خۆی لە خۆیدا ئەوە (سید الدلائل)ە كە ئەو ناوچەیە عەرەبی نییە و كوردستانییە، ئەگینا ئەو تەقەلایەی بۆچییە؟

كەواتە حكومەتی عێراقی وایكردووە كێشەیەك هەبێ لەنێوان كوردستان و ناوەند، ئیتر هەقە ناوی یاسایی (المناطق المتنازع علیها) هەڵگری وەك كێشەیەكی نێودەوڵەتی، ئێستا كارەكە ئاساییە بۆ چارەسەركردن و بەدواداچوون بۆ دۆزینەوەی ناسنامەی ئەو ناوچەیە كەوتە نێوان دوو لا: عێراقی و كوردستانی.

هەڵبەتە نە كورد نە عەرەب نكوڵی لە عێراقی بوونی ئێستای ئەو ناوچانە ناكەن، كێشە لەسەر ئەوەیە ئاخۆ لەرووی مێژوویییەوە ئەو ناوچانە عێراقی بوونە (عێراقی عەرەبی)، كەواتە بە دیوێكی تری پرسیارەكە ئەوەیە پێش ئەوەی بزانین كوردستانییە، با بزانین عێراقی بووە لە هیچ سەردەمێك لە سەردەمەكانی پێش ١٩٢١. لەوەش پێویستمان بەوە دەبێ سنووری سەرووی عێراقی عەرەبی دیاری بكەین پێش ئەوەی سنووری خوارووی كوردستان دیاری بكەین.

**سنووری سەرووی عێراق (عێراقی عەرەبی):**

١- ناوی عێراق و پەیوەندی بە عەرەب و سنووری ئێستا: لەبنەچەدا ناوی عێراق لە ئەراكی فارسی هاتووە، یان وەك یاقوت حەمەوی(١١٧٨)م دەڵێ لە (ئیراە)هاتووە، بەپێی (هنری فورستر) ناوی عێراق لە سەدەی (٧) سەریهەڵدا[٤٤]، ئەو ناوچەیە بە ئێرانشار ناودەبرا(هەروەك لەنامەكەی ئەسكەندەر بۆ ئەرستۆ وەڵامەكەی بەرووونتر دەردەكەوێ)

[٤٥]، یاقوت حەمەوی و خەوارزمی و ئەلبیرۆنی و تێکراییەك هەیە(وەك ئەرستۆ) دەڵێن عێراق بەشێکە لە ئێرانشەهرو بلاد جبال، دیارە هەندێ جاریش بە عێراق ووتراوە (دل إیران شهر)[٤٦]، لە تەورات ٥ جار بە(ارام نهرین)هاتووە لە تەرجەمە عەرەبییەکەی، ئەویش لە بنەچەدا لە میان رۆزانی فارسی هاتووە وەك یاقوت حەمەوی باسی دەکات.

تا ئەو دواییەش عەرەب لە ناوەراستی عێراقی ئێستا کەمایەتی بوون، سەرەتا مانای جوگرافی عێراق هەموو ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی فارسی دەگرتەوە[٤٧]، بۆیە ئەوکەسایەتیانەی نازناوی (العراقي) هەڵگرتووە زیاتر کورد و عەجەم بوونە، دوای لە کۆتایی سەدەی ١١ کووفەو بەسرە بوونە (العراقان)، بەشێوەیەك بەسرە (العراق العربي) پێی دەگوترا و لە(کوفە) بەرەو بەغداو و روو لە ئێران و سند بە (عراق العجمي) هەژمار کراوە[٤٨]، کە ناوی عێراق لە مێژوو هات نابێ ئەو سنوورەی ئێستامان بێتە پێش چاو، لە کێشەی ویلایەتی موسڵ لیژنەکەی (عصبة الأمم) لەخەڵکی خوارووی موسڵی پرسی بوو ئێوە عێراقین یان عوسمانی، لە وەڵامدا ووتیان هەرگیز ناوی عێراقمان نەبیستووە[٤٩]، ناوی عێراق لە رێکەوتنامەکانیش نەدەهات تا کۆنگرەی لۆزانی ١٩٢٣ بۆ یەکەم جار دوو جار ناوی عێراق لە ماددەی (٣) هاتووە، لە رێکەوتنامەی سیڤەر هیچ ناوێکی عێراقی لەبەشە ئینگلیزەکەی نییە، لە ماددەی (٩٤)ی سیڤەر بەناوی (میزۆپۆتۆمیا ئەلعەرەبییە) هاتووە (کەچی سی جار ناوی کوردستانی تیا هاتووە)، لەدوای داگیرکردنی یەکەم جار لۆردکیرزۆن ئەو ناوچەیەی میزۆپۆتامیای ناو نا عێراق[٥٠]، بەو شێوەیە ناوی عێراق گوزارش لە پەیوەندییەکی مێژوویی و یاسایی و سیاسی و نیشتمانی نێوان عەرەب و عێراق ناکات.

٢- ئەو ناوچەیە لە مێژوودا کۆمەڵێك ناوی جوگرافی شارستانی هەڵگرتووە لەوانە: ناوی سۆمەر و ئەکەد و ئاشوور لە هەر سێ نەخشەی (ئێرانتویتنس- ١٩٦) پ.ز[٥١] (هیکاتابۆسی-٤٧٥ پ ز)، (هێرودۆتس- ٤، ٥قرن پ ز) [٥٢]. هەریەکە لەوانەش لە نەخشەکەی (هیرۆدتس) هاتووە لەیەك کاتدا لە شوێنی جیاجیای عێراقی ئێستا، فۆرستەر دەڵێ کلد لە دەورووبەری بەسراو ئەو شوێنەی ئێستا شیعەی لێ نیشتەجێن و دوای ناونرا عێراقی عەرەب[٥٣]. هەر لەنێوانی(٤-٢)پ ز یۆنانی ورۆمانییەکان ناویان لە سەرووی بەغدا ناوە میزۆپۆتامیاو ئەو ناوە بۆ ئەو ناوچە بەکارهاتووە لە هەموو دونیا، بە خوار بەغداش ووتراوە میزۆپۆتامیای خوارو[٥٤].(بروانە نەخشەکانی یۆنانی کۆن و نەخشەکانی تر لە کتێبی: تاریخ العالم-dtv -هیرتمان).

لەدوای ئەوانە ناوی تری وەك (بلاد مابین النهرین)هاتووە، زۆربەی وا تێگەیشتون کە ئەوە تەرجەمەی میزۆپۆتامیا، راست نییە، یاقووت حەمەوی لە (معجم البلدان) روونی کردووەتەوە و دەڵێ: بلاد مابین النهرین تەرجەمەی(میان رۆزان)ی فارسییە[٥٥]، هەرچی میزۆپۆتامیایە وا پێدەچێ لە ناوی سووردراوی (جەزیرە و بۆتان) هاتبێ لەو کاتەی کە سوپاکەی زەینەفۆن بەو ناوچەیە رەت بووە.، بلاد مابین النهرین، وادی الرافدین، السواد، بەشێکی لای رۆژئاواش بە (بادیە الشام) ناوزەد بووە، لەخوارو و رۆژئاواش بە (نەجد) ناودەبرا، لە خوارەوەش لەو دواییە پێیدەوترا (منتفك) و جزیرە، وادی الرافدین نزیکە لە بلاد مابین النهرین، بەڵام کەمێك فراوانترە، لە سەرووی (جبل حەمرین) بە ئیقلیم جبال و بلاد الکورد و بلاد جزیرە و شهرزور-کوردستان ناوزەد دەکرا.

لەو شوێنانەی کەناوی عێراق بەگشتی هاتووە وفراوانترین سنووری پێ دراوە، بریتییە لە سنووری بەغداو بەسرە، لەکاتی دروستکردنی عێراق لەلایەن بەریتانیاو وەزارەتی هیندی بەریتانی هەر لە زووەوە تێبینی جیایی ویلایەتەکانی موسڵ وبەغداو بەسرەی لە(یاسای عوسمانی)[٥٦] کردبوو، دەلیلی عێراقی عوسمانیشیان هەر بەغداو بەسرەی گرتبۆوە.

٣- سنووری عێراقی عەرەبی و عێراقی عەجەمی. بەپێی: لسان العرب، وقاموس المحیط وسیاحتنامە و نەخشەی ئیبن الحوقل و نەخشەکانی عوسمانی وزۆری تر عێراقی عەرەبی دەورو بەری بەسرای گرتووەتەوە[٥٧] تا نزیك کوفە، هەرچی عێراق العجمیە لە سەرووی بەسرە بەرەو کوفەو بەغدا تا نزیك کەرکوك وبۆ ئێران تا سند سنووری بووە.

٤-سنووری هەردوو عێراق پێکەوە(بۆ ئەوەی عەجەمی و عەرەبی لێك جیا بکرێتەوە) لە سەدەی (٩) دابەشی ١٢کورو(ئوستان)کراوە بۆ وەرگرتنی باج بریتین لە (شاد فیرۆز، شاد هەرمز، شادقوباد، بازیجان خسرۆ، شاد سابور، شاد بهمن، چوار تاسوج، ئەردەشیر، زەوابی، باه قوبادسەروو، باهقوبادی خواروو، باهقوبادی ناوەراست، باه قوبادی نزم)[٥٨]، وەك دەبینین ئەو ناوچانەی (دابرێنراوەکان) تێدانەبووە.

٥- عێراق لە مەعجەمەکان و گەریدەکان.

ا- لە کتێبە کۆنەکان عێراق لەسەر عەرەب پۆلین نەکراوە[٥٩]، ئیبن بەتوتە لە (الکتاب الروض المعطار في خبرالأقطار ص١٦٣مادة: بلاد العرب)و زۆربەی سەرچاوە کۆنەکان ناوی عێراق لە بلاد العرب تیا نەهاتووە.

ب- لە نامە وەڵامەکەی ئەرستۆش بۆ ئەسکەندەری مەقدۆنی ناوچەی بابل بە ئێرانشار و عەجەم دەبا، بۆ زیاتر معجم البلدانی یاقوت حەمەوی زۆر بەووردی ئەو زانیارییانەی روون کردووەتەوە.

پ- لە باشترین دۆخیدا (الإمام الذهبي) لە کتێبی (العبر في خبر من غبر- ج١ ص٦٦٨) باس لە دەسەڵاتی (قائم بأمر الله) دەکا بەو شێوەی خوارەوە: وأما دست السلطنة بالعراق فكان لجلال الدّولة (بغداد وواسط والبطائح وبعض السَّواد) وليس له من ذلك أيضًا إلا الخطبة فأما الأموال والأعمال فمنقسمة بين الأعراب والأكراد والأتراك...

ت- خزومي و ئیستاخاري وابوالفدا وابن الفاجي وابن روستة وفضل الله: بەغداد پایتەختی عێراقەو موسڵیش پایتەختی جەزیرەیە[٦٠].(ابو عبید) لە کۆنەوە بەیانی کردووە کە عێراق: طوله وعرضه ثمانون فرسخاً[٦١].

هەرچی جوگرافی ناسەکانی ئەو دواییە لەوانە-

ج- هەریەکە لە لازاریف و نیکیتین و مینۆرسکی: لە بارەی

**ویلاتی موسڵ، سنووری عێراق بریتییە لە سنووری سەرووی دەشتایی(سهل الرسوبی) بلادمابین النهرین. .**

**چ-(فۆرستر)یش: دەڵێت سنووری سەرووی عێراق دەگاتە هێڵی ٣٤..**

**ح- زۆر بە روونی (کی لیسترنگ) لە (بلدان الخلافه الشرقیه ص١١٦) دەڵێت سنووری عێراق نەگەیشتووەتە نزیك موسڵیش، موسڵ لەسەدە(١٠) هەمووی کورد بوون، ابن حۆقلیش هەروا دەڵێت و گەرەکەکانیشیان بە ناوی: لاری و هەزبانی و حەمیدی. . بووە.**

**خ-(کوتلوف) وا باسی سنووری سەرووی عێراق دەکات: حوضي نهري دجلة والفورات من حوالي بغداد الى الجنوب من مدينة بغداد، اما شمال بغداد فهو منطقة كوردستان الجنوبية[٦٢].**

**٦- سنووری عێراق لە نەخشەکان: بەشی زۆری نەخشە کۆنەکان لەدیاریکردنی عێراق جیاوازییەکی وایان لەنێوان عێراقی عەرەبی و عەجەمی نەکردووە، ئینجا کەمێك نەبێت ئەوانی تر بە ناوی میزۆپۆتامیای خواروو یان بلاد مابین النهرين الجنوبيه دەربراوە هەندێکیان لێ هەڵدەبژێرین:**

**ا- روون ترینیان نەخشەی ئیبن حۆقلە٩٩٧ز سنووری عێراقی عەرەبی لەهەر چوار لا دیاریکردووە لە سەرووی بەسرە ناگاتە کوفە[٦٣].**

**ب- لە نەخشەی قەزوینی لە رۆژهەڵاتی دیجلەو نزیك بەغدا لە چوارگۆشەیەکی بچووك هاتووە[٦٤].**

**پ-لە نەخشەی بەلخی (٩٣٤ مردوە) بە ناوی (سواد العراق) هاتووە:- هەندێ ناوچەی (بابل وکوفە وبەسرە و واسیت) دەگرێتەوە، هەڵبەتە لەلایەن جوگرافی ناسە عەرەبەکان ئەو نەخشەیە بە (صوره العراق) لە (العراق في الخوارط القديمة) پۆلین کراوە، لەوێ سنووری سەرووی بە روونی دیاریکراوە کەمێك لە سامەرا(لەوی بە سر من رای-تۆمارکردووە) ناگاتە تکریت[٦٥].**

**ت-نەخشەکانی خوارزمی (٨٤٥ز)، بنیامین بن حنا(١١٦٠-١١٧٣)، ابو الحسنابن سعید(١٢٧٤ز)، ئەلبیرۆنی(١٠٣٠ز)، ابو الفداو(١٣٣١ز)ابن سعید المغربی (١٢٧٤)، عێراق بریتییە لەو نەخشانە لە خوارووی بەغدا تا نزیك کەنداو، نێوان دجلەو فوراتیش لە سەرووی بەغدا بە جەزیرە هەژمار کراوە.**

**ج-لە نەخشەی مقدسی ومسعودی لە(ص٣٦التنبيية) دەقەکەی واهاتووە:(ان العراق يشتمل على البلادالمحصورة بين الزابين والكائنة في ماوراء سامراء، ويمتد حتى الحدود"السن" و"التكريت"مع القسم من منطقة هوليوان المقارب للجبل وذلك الجزء من منطقة الهيت)[٦٦].**

**چ- لە نەخشەی قەزوینی(سەدەی ١٣) زۆر بە وردی عێراق و بەغدا وا لێك جیاکرایەتەوە هیچ پینەو پاساوێك هەڵناگرێ، چونکە هەریەکەی لەناو چوار گۆشەیەك بە جیا کردووە[٦٧]. عێراق کەوتوونەتە رۆژئاوای بەغدا.**

**ح-لە نەخشەی ژ:١ی کتێبی گەریدەی بە ناوبانگی بەریتانی (کی لیسترنگ ١٨٥٤-١٩٣٣) لە (اقاليم اسية الجنوبية الغربية في ايام الخلافة العباسية) عێراق لە خوارووی بەغدا دیاریکراوە، لە نەخشەی ژ:٢ سنووری اقلیم جزیرە و عێراقی دیاریکردووە گوزارش لەسەردەمی عەباسی دەکات، سنووری سەرووی عێراق دەگاتە هێڵی: حەدیسە، تکریت خوارووی داقووق..، لە نەخشەی ژ:٥ بە روونی هەردوو نەخشەی کوردستان و ئیقلیمی عێراقی بە جیا دیاریکردووە، بەڵام لێرە عراق العجميه عەرەبییەکەی دیاری نەکردووە.**

**خ- لە هەردوو نەخشەی ئیداری بەشی ئاسیای عوسمانی ١٨٩٣ و١٨٩٦ عێراق لە خوارووی بەغدایە.**

**د- لە نەخشەی سایکس پیکۆی ١٩١٦تەنها بەغدا و بەسرەی بە میزۆپۆتامیای خواروو(عێراق) دیاریکرد.**

**٧- فراوانترین سنووری عێراق: لە(معجم ما استعجم): العراق هو مابين هيت الى السند و الصين الى الري خراسان الى الديلم والجبال واصبهان، ئەوە فراوانترین نەخشەی عێراقی عەجەمە، هەرلە نەخشەی ئیبن حوقل تا نەخشەکانی عوسمانی[٦٨] مەعجەم وکتێبە مێژووییەکان هەمووی خوارووی کووفە تا نزیك بەسرە بە عراق العربي دەناسن، بەڵام بابزانین فراوان ترین نەخشەی عراق کەباس کرابێ د.ئەحمەد سووسە گەراوە لەنێو ئەو هەزارەها نەخشەیە هەرە فراوانترینەکانی لە کتێبەکی بەناوی(العراق في الخوارط القديمة) کۆکردووەتەوە، لەو نەخشانە وەك لە (آثار البلاد واخبار العباد) و(عجائب البلدان) هاتووە: سنووری عێراق بریتییە لە عەبادان تا تکریت ونزیك موسڵ، دەبێ تێبینی بکرێت ئەو سنوورە فراوانە بۆ عراقی عەرەبی نییە بەڵکو ئەو ناسنامە ووردەی دیاری نەکردووە هەر ووتویەتی عێراق، ئیتر لەو کاتییەوە ئەوانەی ئەو زانیارییەیان لە بارەی سنووری سەرووی عێراق دیاریکردووە ئەوەیان لێك نەکردووتەوە عێراقی عەرەبی یان عەجەمی هەروەك لە دوایش بەریتانیا لە کێشەی ویلایەتی موسڵ پەیرەوی کرد، سەرەرای ئەوەش لە دۆخە هەرە فراوانەکەی لەخوار (جبل حەمرین) سنووری عێراقە، ئەوە لەگەڵ (تەقویمی عوسمانی ساڵی١٧٠٠وا دێتەوە کە ئەوکاتیش هەرموسڵ سەر بەحکومەتی دیاربەکر و بەغداو بەسرەشی خستبووە سەر میزۆپۆتامیای خواروو، موسڵ لەکۆنەوە سەر بە دیاربەکر بووە[٦٩]، قەزوینیش لە باسی دیاربەکر دەڵێ موسڵ شارۆچکەیەکە سەر بە دیاربەکرە[٧٠].**

**یاقوت حەمەوی(١١٧٨)م لە معجم البلدان ص٢٩٠ لە زۆر شوێن باس لەو سنوورە دەکا بە بۆنەی جیاجیا، لە باسی (حلوان و هەبوونی شاهەنجیر لێی) دەڵێ: حەلوان دواسنوورە لە سەواد و عێراق کەمێك سەرووی بەغدایە کە بە هەرێمی شاخ ناودەبرێن، لە کتێبە کۆنەکان عێراق لەسەر عەرەب پۆلین نەکراوە، هەمووشیان لەگەڵ بروسکەکەی چەرچل تێك دەکەنەوە کە سوپای بەریتانی گەیشتە سەرووی بەغدا داوای لێکردن بووەستن و ووتی خوارووی جبل حەمرین بە سەرووەوە سنووری کوردستانە[٧١]، ئیتر باس لەوە کە کوردستانی خواروو بەشێك بێت لە عێراق نەك هەر دەشێ و ناشێ بەڵکو ئیقلیمیشیان لێك جیا بووە[٧٢].**

**٨- سنووری عێراق بەپێی سنووری ئیدارەی سەرووی ویلایەتی بەغدا. - بغداد: ويشمل (١١) قضاءاً وهي: الكاظمية، العزيزية، العانة، الدليم، الكوت، الجزيرة، مندلي، خانقين، بدرة، جسان، سامراء[٧٣]، بەپێی(وفيات الأعيان)**

و سەرچاوەی تریش لەسەردەمی مەغۆلەکانیشدا بەشی ئیدارییەکەی ئەو ناوچەیە وەك خۆی بوو بەشێوەیەك کە سنووری سەرووی ویلایەتی بەغدا تا تکریت بووە، موسڵیش سەر بە دیاربەکر بووە[٧٤]، قەزوینیش لە باسی دیاربەکر دەڵێ موسڵ شارۆچکەیەکە سەر بە دیاربەکرە[٧٥].

٩- سنووری عێراق لە سەردەمی عەباسی و عوسمانی.. لە سەردەمی عەباسی هەندێ جار بە ویلایەتی کوفە ووتراوە عێراق، دوایی کە پایتەخت بووە بەغدا ئەوا ئەویش بووە بە ویلایەت، سنوورەکەی دەگەیشتە سامەڕا، لە سەردەمی عوسمانی عێراق ویلایەت نەبووە، بۆیە ناوی عێراق لەلای خەڵکیش بزر بووە، باشترین بەڵگە (لە ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ) بە ووردی باس لەوە دەکات کە ناوی عێراقیان هەر نەبیستبوو.

١٠- سنووری عێراق لە ڕێکەوتنەکانی نێودەوڵەتی هاوچەرخ:

ا- لەڕێکەوتنی ئەرزەرۆم: لە١٨٢٣/٧/٢٨بەسترا، پێکهاتووە لە (٧) بەش- لە بەشی یەکەم باس لە کوردستان دەکات و دەڵێ سنووری دەگاتە نزیك بەغدا.

ب- لە ڕێکەوتنی سایکس-پیکۆ ی ١٩١٦ لەهەردوو ماددەی (١) و(٢) تیایدا سنووری سەرووی عێراق دیاریکراوە وەك لە نەخشەی سایکس پیکۆ دیاریکراوە هەردوو ویلایەتی بەغداو بەسرەیە، ویلایەتی موسڵی لەگەڵ نییە واتە ئەوناوچانەی کە ئێستا پێی دەوترێ (المناطق المتنازع عليها) نەدەگرتەوە.

پ- لە ڕێکەوتنی سیڤەر سنووری عێراق بەپێی سنووری کوردستان لە ماددەکانی(٦٢ و٦٣ و٦٤) دەکەوێتە پشت فورات و بە لێڵی لە ماددەی (٢٧)یش بەکراوەیی مایەوە.

١١- سنووری عێراق لە کاتی هێرشی بەریتانیا بۆ سەر عێراق:

ا- سنووری عێراق لە بروسکەی چەرچل -دەقی بروسکەکە بۆ مەلیك فەیسەڵە دەڵێ: ئێمە بەڵێنی پێکهێنانی دەوڵەتۆکەیەکی عەرەبیمان پێدایت نەك ئیمپراتۆرییەت، بۆیە سنووری تۆ (جبل حەمرین)ە لەوێ بەسەرەوە کوردستانە. لە بەڵگەنامەیەکی تری بەریتانیا(١٦٢٦٧/f٥٧١)تیلگرام ژ:٦١٦ هەمان ڕاستی دووبارە دەکاتەوە[٧٦].

ب- لە یادەوەرییەکانی ڕۆژی ١٤ی ئاداری ساڵی ١٩١٥ لەلایەن سیر ئەرسەر هیرتزل دەڵێ کاتێ سوپای بەریتانی سەرکەوتنی بەدەستهێناو لە ساڵی ١٩١٧ بەغدای گرت بەرەو سەروو چوو، بە بروسکە ئاگادارمان کردنەوە کە لە (جبال حەمرین) نەپەڕنەوە با تووشی ڕووبەڕووبوونەوە نەبن لەگەڵ کورد[٧٧].

١٢- سنووری عێراقی سەروو لەدوای دروستبوونی تا ساڵی ١٩٢٥ لە. (١٠) لیواو٣٥ قەزا و٨٥ ناحیە پێکهاتبوو[٧٨]. واتە ئەو ناوچانەی کوردستانی بە کەرکوکیشەوە نەدەگرتەوە.

لەوەی سەروو بەڕوونی بۆمان دەردەکەوێ سنووری سەرووی عێراق لە باشترین دۆخیدا، لەو دۆخەی کە عێراقی عەرەبی و عەجەمیش تێکەڵ کراوە ئینجا گەیشتووەتە تکریت و خوارووی چیای حەمرین.

*** هەڵەیەکی کوشندە پێویستە ڕاست بکرێتەوە:**

دووبارە لەوەی سەروو بۆمان دەردەکەوێت کە مێژووی سیاسی عێراق لە ساڵی ١٩٢٠ بەدواوە دەستپێدەکا، واتە لە پێش ئەو مێژووە عێراق نە دەوڵەت بووە نە ئیمبراتۆرییەتێك بەناوی عێراق، لەسەردەمەکانی عوسمانی و بووەیهی و فارسی و مەمالیك، ویلایەتیش نەبووە، تەنها لە سەردەمی عەباسی ویلایەت بووە، شاری بەغداش پایتەختی عەباسی بووە نەك عێراق، زۆربەی مێژوونووسەکان بەپێی بارودۆخی یاسایی و سیاسی ئێستا باسی بارودۆخی ئیداری و سیاسی بەغدای ئەوسا بە عێراق دەکەن، ئەوەش هەڵەیەکی کوشندەیە.

لەلایەکی ترزۆربەی نووسەرو مێژوونووس و سیاسەتمەداران بەپێی واقیعی ئێستای عێراق وێنەی مێژووی ئەو ناوچەیە دەکێشن و پەرەگراف وا بەرچاو دەکەوێ: (عێراق لە سەردەمی عوسمانی پێکهاتبوو لە سێ ویلایەتی موسڵ و بەغدا و بەسرە)، (هێرشی ئەسکەندەر بۆ سەر عێراق)، (هێرشی بەریتانیا لە ساڵی ١٩١٤ بۆ سەر عێراق)، (هێرشی سەفەوی بۆ سەر عێراق)، (باری سیاسی عێراق لە سەردەمی میدییەکان)، (کورد لە ململانێی نێوان عێراق و بەریتانیا)... هەموو ئەو عیبارانە هەڵەو چەوتن، ئەوە مانای ئەوە دەدا کە عێراق لەپێش ساڵی ١٩٢٠وە کیانی سیاسی و ئیداری و سنووری جوگرافی ئێستای هەبێ، کە نییەتی، بەشێك لە عروبیە شۆڤێنییەکان بە مەبەست ئەو کارە دەکەن، بۆ ئەو مەبەستەش پەنایان بۆ تەزویریش بردووە، زۆربەی هەرەزۆری ئەو بەڵگەنامانەش پێش ساڵی ١٩٢٠ ئەو ناوچەیان بە ناوی تری وەك میزۆپۆتامیاو (بلاد الرافدين) و.. ناوبردووە، ئەگەر کۆنتریش بێت بەناوی بلاد اشور، بلاد بابل... کەچی هەرچی ناوی میزۆپۆتامیایە کردوویانە بە عێراق، لە ماددەی (١) و (٢)ی ڕێکەوتنامەی (سایکس-پیکۆ) ناوی عێراقی تیا نەهاتووە، بەڵکو (پیتی B) بۆ ئەو ناوچەیەی ئێستا بەشێکی (ناوچە دابڕاوەکانە) لەگەڵ ناوچەی (سووری) ویلایەتی بەغداو بەسرە.. لە تەرجەمەی عەرەبی (داخليە العراقيە)ی بۆ زیادکراوە، . . بەکورتی ناوی عێراق لەو بەڵگەنامە مێژوویی و دیکۆمێنت و ڕێکەوتنامانە نەهاتووە تا ساڵی ١٩٢٣ بۆ یەکەم جار لەماددەی (٣)ی لۆزان دوو جار ناوی عێراق هاتووە.

***زیانی نیشتمانی لەو هەڵەیە:-**

ئەوە هەر هەڵەیەکی ئەکادیمی و مێژوویی سادە نییە، بەڵکو ئارەزوومەندانە بێت یاخود نا مەبەستەکانی زۆر ترسناکە، وێنەیەکی سیاسی و یاسایی و دەروونی وا دەدا کە ئەو عێراقە بەو شێوەی ئێستای زۆر کۆن و ڕەسەن بێت، ئیتر کوردستانی خواروو سەر بەو عێراقە بووە، ئەگەر وابێت ئیتر تازە بەتازە کورد چی دەوێت، مانای فیدراڵی و ناوچە دابڕاوەکان و... مانایەکی نامێنێت، زیاتر لەوەوە سەرچاوەی تۆمەتەکانی وەك (کورد گێرە شێوێنن، دەستکردن، ئیسرائیل و ڕۆژئاوا دەیانجوڵێنن) ساناتر وەردەگیرێ و جورئەت بە هەندێ زانای ئاینی دەمارگیری عەرەبی داوە فتوای دژ

بەفیدرالی و مافی چارەنووسی کورد بدا، ئەو کاتی وا دێتە بەر چاو کە کورد سەربە گۆبەنە وەك دەڵێن (مشكلة الكردية). ئەوەی جێی سەرنجە لە پرۆگرامی باڵای کوردستانیش ئەو هەڵە کوشندەیە پیادە دەکرێ و بووەتە بەشێك لە راستی مێژوویی لای زۆربەی ئەکادیمی و سیاسەتمەدارانی کوردستان چ جای زۆرینەی خەڵك.

راستییەکەی ئەوەیە: لە چوارچێوەی پرۆژەی ئیمپریالی و ئیسرائیلی(ئەوانەی لە فەلەکی ئەوانەش دەسووڕێنەوە) ناوچەی رۆژهەڵات دابەش کرا، عەرەب بۆ ۲۲ پارچە، کوردستان بۆ (٥) پارچە، ئەو سنوورانەش بە دەستکردی دروستکراون، سنووری عێراقی(هەردووعێراق) لە مێژوودا یان نەبووە یان گوزارشتێکی جوگرافی هەبووبێ کەمێك لە سەرووی بەغدا تا نزیك تکریت هەبووە. لە ساڵی ۱۹۲۵ کوردستانی خوارووش بە عێراقی دەستکرد لکاوە، کەواتە کێشەکان و سنوورەکان روون و ئاشکران، بزر نییە لە زەلکاوی مێژوو.

لەسەر ئەو بنچینەی سەروو، پاڵپشت بە دیاریکردنی سنووری سەرووی عێراق کە لە سەرو تۆمارمان کرد، ئەوا دیاریکردنی سنووری خوارووی کوردستانیشە، یاخود سنووری خوارووی ناوچە دابڕاوەکانە، پرسەکە زۆر ئاسان دەکا بۆ هەر حوکمێکی زانستی یان سیاسی و یاسایی ئینجا ویژدانی و حەق بێژیش.

*** بەرەو ساغکردنەوە:-**

ویلایەتی (شارەزوور و موسڵ) کوردستانییە یان عێراقی سەرەتای موسڵ وەسفی بە چەند ئاوەدانی و ژیارێکی سەرەتایی هاتووە، دوای ئەردەشێر ناوی فەرمی لێنا هەروەك یاقوت حەمەوی(۱۱۷۸)م دەڵێ یەکەم جار ناوی موسڵ (نوئەردەشێر) بوو[٧٩]، ئەردەشێریش بەپێی نامەکەی (ئەردەوانی پێنجەم) کورد بووە[٨٠]، بۆیە سەرەتای ناوی موسڵ ناوێکی کوردی بووە، لە راستیدا سەرەتای زۆربەی شارەکانی ئەو ناوچەیەی (ئێستا پێی دەوترێ عێراق) عەجەمی بووە، بابل لە باڤیلی کوری کیسرا هاتووە، بەغدا لە باخی داد هاتووە، سامەڕرا لە (سام را) هاتووە، حەدیسە لە بنەچەدا ناوی (نۆگرد) بووە، لەدوای ئەمەوی ئەو ناوانە تەعریب کراون، لە راستیدا بەمەبەستی تەعریب نەبووە، وەك لەو سەردەمە ئەو مانایە وەردەگرێ، زیاتر مانای بەئیسلامی کردنی ناوەکان بووە هەروەك بە ئیسلامی کردنی ناوی کەسەکانیش بە تەرازووی ئێستا مانای تەعریب وەردەگرێ، لەو چوارچێوەیە ناوی نوئەردەشێریش گۆڕا بۆ (موصل)، بەمانای بەیەك گەیاندنی دوو هەرێمی جیا(هەرێمی جەزیرە) و (هەرێمی عێراقی عەجەمی)[٨١]، هەندێکیش دەڵێن (موصل) نییە، بەڵکو (موسیلا)یە هەروەك زەینەفۆنیش وای ناو بردووە، ئەوەی ئەو رایە بەهێز دەکا لەو سەردەمی ناوی عەرەبی خۆی هەبووە بەناوی(خولان) وەك مقدسی و(کی لیسترنگ)[٨٢]دەڵێن، ناوی ئارامییەکەشی(عبوریا)بووە، بەو پێیە بێت موسیلای کوردی بووە دوای عەرەب بە موصل دەریان بڕیوە، ئەوەی شارەزای تەعریبی ناوی شار و ناوچە و میللەتان بێ لە ناخی نووسەرە ئیسلامییەکان بەمەبەستی پیرۆز کردنیان(نەك تەعریبی ئێستا) زیاتر ئەو رایەی لا پتەو دەبێ، هەروەك ناوی گریناد لە ئیسپانیا بووە غرناطة، ئامێدی بووە عمادیە، (نوی گرد) کرا (حديثة) . .، بەپێی هەندێ سەرچاوە لەوانە(ابن الفقيه)یەکەم عەرەب کە هاتە موسڵ ناوی (هرثمة بن عرفجة البارقي)بووە کە لەگەڵ (عتبه بن فرقد) هاتبوو[٨٣].

مێژووی ئیداری زۆر کۆن نییە لە ساڵی ۱۸۷۹ز ویلایەتی شارەزوور گواسترایەوە بۆ موسڵ، لە سەردەمی عەباسی سنووری سەرووی ویلایەتی عێراقی دەگەیشتە سامەڕاو تکریت، لەوێ بە سەروو بەپێی قۆناغەکانی مێژوو سنووری خوارووی ویلایەتی شارەزوور یان ویلایەتی دیاربەکر یان ویلایەتی جەزیرە یان (ویلایەتی موسڵ لەو دواییە) بووە، هەرچییەك بێت لەرووی ئیداری، بەڵام هەرگیزاو هەرگیز لەرووی ناسنامەی نیشتمانی سەر بەعێراق نەبووە هەر سەر بە کوردستان بووە، هەروەك لە رێکەوتننامەکانی ئەرزەرۆم و سایکس بیکۆ و سان ریمۆ و سیڤەر، باشترین و روونترین بەڵگە هەردوو نەخشەی۱۸۹۳ و۱۸۹٦ی عوسمانی-ئیداری بەشی ئاسیای ویلایەتەکانی عوسمانییە، ئینجا راپۆرتی لیژنەی(عصبة الأمم) لە بارەی ویلایەتی موسڵ بەروونی ویلایەتی موسڵ وەك بەشێك لە کوردستان گوزارش کراوە، کە دەڵێت: ئەگەر بەڵگەکە رەگەزی بێت ئەوە پێویستە یەکسەر دەوڵەتێکی کوردی لە ویلایەتی موسڵ پێك بهێنین چونکە ٥/٨ی خەڵکەکەی کوردن[٨٤]، ئەوە لە کاتێکدایە کە نوێنەری کورد لەو کێشەیە نەبووە و لەدوایشدا ئەندامانی ئەو لیژنەیە لە نووسینەوەی یاداشتەکانیانە باسیان لەوە کردووە کە قەناعەتی تەواویان بە تورکیا و بەریتانیا نەبووەو کورد لەو راپۆرتە مەغدور کراوە، کوردستان هەر ویلایەتی موسڵ نەبووە، ویلایەتەکانی ئامەد، بەشێك لە ویلایەتی شام، کوردستان بوونە، بۆیەش هەندێ جار لە ئاستی ویلایەت بەرزتر بووە بۆ ئاستی ئیالەت[٨٥].

ویلایەتی موسڵ سەر بە ویلایەتی بەغدا نەبووە، یان سەربەخۆ بووە وەك لەدوای ساڵانی۱۸۷۹، زیاتر لەگەڵ جەزیرە و دیاربەکر هەرێمیان پێکهێناوە، لە دائیرەی مەعارفی فەرەنسی دەڵێ جەزیرە و موسڵ و کەرکوك و هەولێر و سلێمانی و رانییە و کفری یەك یەکە پێکدەهێنن، هەرچی لە راپۆرتی ویلایەتی موسڵە ئەویش دەڵێ:- موسڵ و کفری و کەرکوك و ئەربیل و سلێمانییە و رانییە یەك یەکەن[٨٦]، لە (عجائب البلدان- لسراج الدين ابن الوردي -مادده: ارض الجزيرة): روونتر بۆی هاتووە و دەڵێ: ارض الجزيرة هي جزيرة ابن عمر، وتشتمل على ديار ربيعة ومضر، وتسمى ديار بكر، وهي ما بين دجلة والفورات وكلها تسمى بالجزيرة، وبها مدن وقرى عامرة. ومن مدنها المشهورة الموصل، لە مەعجەمە کۆنەکانیش کە زاراوەی (موصلان) هاتبێ مانای موسڵ و جەزیرەی وەرگرتووە[٨٧]، بەپێی(ابن خلكان۱۱۱۲-۱۲۸۲) زۆر زانای تریش لە سەردەمی مەغۆلەکانیشدا بەشی ئیدارییەکەی ئەو ناوچەیە وەك خۆی بوو بە شێوەیەك کە سنووری ویلایەتی بەغدا تا تکریت بووە، موسڵیش سەربە

دیاربەکر بووە[٨٨]، (تەقویمی عوسمانی ساڵی ١٧٠٠ وا دێتەوە کە ئەو کاتیش بەغداو بەسرەی خستبووە سەر میزۆپۆتامیای خواروو موسڵ هەر سەر بەحکومەتی دیاربەکربوو[٨٩]، قەزوینیش لە باسی دیاربەکر دەڵێ:- موسڵ شارۆچکەیەکە سەر بە دیاربەکرە. تەنانەت سەنگ و کیلۆ و دراویشیان لەگەڵ بەغدا لێك جیابووە[٩٠]. حیزبی ویلایەتی موسڵ هەبووە لەنێو عەرەبەکان بە ناوی (جمعیة الدفاع الوطني عن ولاية الموصل)[٩١] بەپێی ماددەی (٢ و٣و٤)ی پەیرەوی ناوخۆی مەرجی بە ئەندام بوون ئەوە بوو کە دانیشتووی ولایەتی موسڵ بێت، لە یاسای عوسمانی جیاوازییەکی روون لەنێوان ویلایەتی بەغدا وموسڵ هەبووە وەك(غاربیت)لە وەزارەتی هیند بە ووردی تێبینی کردبوو[٩٢].

جارجار لەکاتی ئاڵۆزی ئەو ئاڵوگۆڕییە هەبووە، جار وابووە ویلایەتی موسڵ خراوەتە سەر بەغدا، جاریش وابووە بە پێچەوانە.. ئەوە لە زۆربەی ویلایەتە دراوسێکان کراوە، تەنها لەنێوان موسڵ و بەغدا نەبووە و وەك لەلایەن عروبییە ناشیۆنالیزمییەکان کراوەتە پاساو بۆ ئەوەی کوردستانی خواروو سەر بە عێراق بووە. گەلێ جاری تریش کورد زاڵ بوونە بەسەر بەغدا و لە کوردستان والی بۆ دیاریکراوە، وەك لە سەردەمی عەبدولرەحمان پاشای بابان، موزەفەرەدین و.زولفیقار و محەمەد پاشای کۆرە، هەر بۆیەش دەبینین (فۆرستەر)لە کتێبەکەی(نشأة الدولة العراقية ص١٠٨)دەڵێ لە ساڵی ١٩١٧ و١٩١٨ بەریتانیا هەوڵی دا ئەو جیاوازییانەی نێوان ویلایەتی موسڵ و بەغدا هەڵگری بۆ یەکخستنیان، سەرەرای ئەوانەش گرنگی سیاسی و ئیداری بەغدای ئەوسا پەیوەندی بە عێراقەوە نەبووە، لەدوای عەباسیش بە دەگمەن نەبێ حوکمی عەرەبی لە بەغدا نەبووە، نزیکەی ٣٠ جار بەغدا بە سانایی داگیرکراوە، هەروەك لە رۆژی وەرگێرانی عێراق لە(عوسبە) لە٣ی تشرینی یەکەمی ساڵی١٩٣٢، سەرۆکی(جمعية العصبة)مسیو بولتس ئەوەی ئاشکرا کرد و ووتی: (ان العراق تحرر من السيطرة الأجنبية منذ عديد من القرون وبإمكانه تجديد أمجاد بابل ونينوى)[٩٣].

عێراقی عەرەبی و ویلایەتی موسڵ زۆر لێك دوور بوونە، بەڵام کە دەڵێن عێراق (بەتێکەڵی عێراقی عەجەمی و عەرەبی) ئەوا سنووریان لەسەر یەك بووە، بۆیەش یەکێ لە چوار دەرگاکانی موسڵ ناوی عێراق بووە، ئینجا ناوەکەشی (موسڵ) بەمانای بەیەك گەیاندنی هەردوو هەرێمی جەزیرە و عێراق[٩٤]، راپۆرتی لێژنەی ویلایەتی موسڵ پانۆرامای رای گەریدەو مێژوونووس و نەخشەساز و مەعجەمە کۆن و نوێیەکانی تێدابوو، ئەوان دەڵێن خەڵکی موسڵ ناوی عێراقیان هەر نەبیستبوو، تەنانەت ناوچەکانی خواروو هەتا بەغداش، بۆیە دەبینین لە رێکەوتنامەی سایکس بیکۆ بەشی سەرەوەی بەغدا بە پیتی (B) دیاریکرا، ناوچەی بەغداش بە رەنگی سوور، ئەوە بەڵگەیە کە ناوی عێراق گوزارشی لە سنوورێکی سیاسی و جوگرافی نەکردووە، بۆیە ئەو پیت و رەنگانە بەکارهاتووە، راپۆرتەکە دەڵێت هەرگیز لەژێر حوکمی عێراقی یان عەرەبی نەبووە، رەنگە لایەنی بەرامبەر بڵێت ئێ خۆ لە راپۆرتەکە نەیوتبوو موسڵ لەژێر حوکمی کوردستانی بووە، لەراستیدا ئەو لیژنەیە نەهاتبوو بۆ ساغکردنەوەی کوردستانی بوون و عێراقی بوونی ویلایەتی موسڵ، بەڵکو بۆ ساغکردنەوەی تورکی یان عێراقی بوو، عەرەبی موسڵ سۆزی عێراقییان نەبووە هەتا لە سەردەمی دروستبوونی دەوڵەتی عێراق، هەر لە راپۆرتەکە باس لەوە دەکا خۆپێشاندانیان کرد و داوای گەڕانەوەی موسڵیان کرد بۆ سەر عوسمانی نەك عێراقی، تەنانەت داواکردنی ویلایەتی موسڵیش هەر لەلای بەریتانیا بووە نەك دەوڵەتی عێراقی، لە رێکەوتنی سایکس بیکۆ ساڵی ١٩١٦ تەنها بەشێك لە ویلایەتی بەغداو بەسرە ئامادەکران بۆ دەوڵەتێکی عەرەبی بەپێی مادده (١) و (٢)ی ئەو رێکەوتنە، ویلایەتی موسڵ درا بە فەرەنسا، دوای لە کۆنگرەی سان ریمۆ بەریتانیا لە چوارچێوەی سەودایەك ویلایەتی موسڵی لە فەرەنسا وەرگرتەوە، لە کاتی کێشەکەی ویلایەتی موسڵ، نوری سەعیدی سەرۆك وەزیری ئەوکاتی عێراق پێشنیاری کرد بە بری بـ(٥٠٠,٠٠٠ لیرەی ئیسترلینی) ویلایەتی موسڵ لە تورکیا بکرێت[٩٥]، ئەوەش باشترین بەڵگەیە کە ویلایەتی موسڵ عێراقی نەبووە.

کەواتە ئەو نەخشە سیاسی و ئیدارییەی عوسمانی ساڵی ١٨٩٣ گوزارش لە راستی مێژوویی و جوگرافی دەکا کە تەواوی ویلایەتی موسڵی خستبووە سەر کوردستان و ئیتر بەپێی هەموو بەڵگەکان ویلایەتی موسڵ ناسنامەیەکی نیشتمانی روونی کوردستانی هەیە، بە دەنگی کوردیش ئەو ویلایەتە گەڕایەوە سەر عێراق ئەگینا عەرەب و تورکمان ئەو کاتی جۆرە رایەکی پێچەوانەیان هەبوو.

رەهەندی کوردستانی لە ویلایەتی موسڵ: دەرکەوت ناسنامەی مێژوویی ویلایەتی موسڵ دەگەرێتەوە بۆ کوردستان، دوایی لە رووی ئیداری و سیاسیش بەرجەستە کرا بەهۆی رێکەوتنی بەدلیسی سوڵتان، لەسەردەمی سوڵتان مورادی سێیەم بە فەرمی لە ساڵی ١٥٨٣میرنشینی ئەردەڵان کەوتووەتە سەر ویلایەتی شارەزوور، لە ساڵی١٦٩١ پایتەختی ئەردەڵان لە زەڵم گوازرایەوە بۆ کەرکوك، ئیبن خەلەکان لە کتێبی دەڵێ: لەسەردەمی سەرەتای ئیسلامەوە هەرناوی کەرکوك راستەوخۆ بەندبووە بە (بلادشهرزور)، هەروەها دەڵێ کەرکوك مەڵبەندی شارەزوور و زۆر میرنشینی کوردی لەوێ بووە[٩٦]، ئەوە بەڵگە نەویستە کە باسی شارەزوور کرابێ مەبەست کەرکوکە، لە (نظام إدارة الولايات)ی عوسمانی کەرکوك بە فەرمی بە شارەزوور تۆمار کرا بوو[٩٧]، بۆیە ناوی کەرکوك نابینی لە مێژوو[٩٨]، تەنانەت لە شیعری تورکی ناوی کەرکوك بە شارەزوور هاتووە: ئەوەتا شاعیر ساڤی بە بۆنەی هاتنی چاپ لە ساڵی(١٢٩٦) کۆچی بۆ کەرکوك ئەو شیعرە پێشکەش بە والی دەکا بۆ ئەو چاکەیەی و دەڵێ:

بنده سی صاف تشکرله دیدی تاریخنی
مطبعة بوییلده شهرزورده اولدي کشاد

دوای کە ولایەتێکی زاڵ بوو بە سەر عوسمانی لەنێوان ساڵانی(١٨٢٦-١٨٣٣) لەسەردەمی سوڵتان مەحمود بیری مەرکەزییەتی ئەڵمانی و فەرەنسی هێنرا، لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٦٤ لەگەڵ دروستبوونی عوسمانییەی

لاو فرمانی مەرکەزیش بۆ ویلایەتەکان دەرچوو، بەرەبەرە موسڵیشیان لەگەڵ شارەزوور کردە شەریك، بۆ یەکەم جار والییەکی غەیرە کورد (محمد ئینجە بەیرەقداری تورك) لە١٨٣٣ تا١٨٣٥بووە والی شارەزوور[٩٩]، لە ساڵی ١٨٧٩ مەدحەت پاشا بە پاڵپشت بە(نظام ادارة الولايات) ی نوێی عوسمانی لە چوارچێوەی مەرکەزییەت ویلایەتی شارەزوور هەڵوەشایەوە و هاتە سەر موسڵ، جارێکی تر لە ساڵی ١٨٨٢ ویلایەت گەڕایەوە کەرکوك بەناوی شارەزوور و موسڵ بۆوە سنجاقێکی شارەزوور، دوای جارێکی تر لە ساڵی ١٨٨٦(باب العالي) گەڕاندییەوە موسڵ. نافعە فەندی[١٠٠] بووە والی موسڵ، لە ٢ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٨٩٣ لەلایەن جواد پاشای (سەدرولئەعزەم) پێشنیارکرا بۆ سوڵتان عەبدولحەمید قایل بێت تا شارەزوور لابرێت ناوی شارەزووریش گۆردرا بۆ کەرکوك.

ئیتر لەو کاتەوە سەرەتای تەقەلای پاکتاوی رەگەزی لە ئیدارەی عوسمانی دەستی پێکرد کە ناوەرۆکەکەی لە کێشەی ویلایەتی موسڵ دەردەکەوێ.

کێشەی ویلایەتی موسڵ بەپێی ماددەی (١) و (٢)ی کۆنگرەی لۆزانی ساڵی ١٩٢٣ گێردرایەوە بۆ (عصبة الأمم)، لەوێش لە دانیشتنی ژ:٣٠ لیژنەیەکی پسپۆر پێکهات لە خەڵکی بێ لایەن، ئەوانە زۆر بە وردی ناوچەکەیان پشکنی بەرەنجامێکی یاسایی گرنگیان بۆ دەرکەوت کە ئەو ناوچەیە نە عێراقییە و نە تورکی، عێراقی نەبوونەکەیمان باسکرد، دەمێنی تورکیایەکەی:

لە راستیدا ئەو ویلایەتە و ٣٢ ویلایەتی تر موڵکی عوسمانی بوون، بەڵام عوسمانی بە خواستی خۆی و دوو ساڵ لەدوای هودنەی مودرسی ساڵی ١٩١٨ برانەوەی جەنگ ئینجا نوێنەری سوڵتانی عوسمانی (هادی پاشا) چوو لە کۆنگرەی سیڤەری ساڵی١٩٢٠ بەپێی ماددەی ١٣٢ وازی لەو ناوچانە هێناوە، بەپێی ماددەی (٦٢)ش بۆ کوردستان، سەرەرای ئەوەش ئەو موڵکەی عوسمانی نابێتە موڵکی تورکیا، چونکە هیچ بەڵگەیەکی یاسایی نییە کە تورکیا میراتگری یاسایی عوسمانی بێت، بە پێچەوانەوە دوژمنی یەکتر بوون و هەردەم تورکیا داکۆکی لەوە کردووە کە ئەو پەیوەندی بە عوسمانی نییەو مۆری رێکەوتنامەکانی عوسمانی هەڵناگرێ، کەواتە ئەو ناوچەیە بەپێی رەوشی یاسایی و راپۆرتی لیژنەی ویلایەتی موسڵیش نە تورکیایە نە عێراقی، کەواتە ئەوەی خستییەوە سەر عێراق بەهۆی کوردستانی بوونی ویلایەتی موسڵ بوو، هەروەك لە راپۆرتەکە دەڵێ ئەگەر توخمی نەتەوەیی بنچینەبێ ئەوا ٨/٥ی خەڵکەکەی کوردن حکومەتێکی کوردی شایستەی ویلایەتی موسڵە[١٠١]، کەواتە ناوچە دابڕاوەکان بەهۆی کوردستانی بوونیان کەوتنەوە سەر عێراق ئەگینا عەرەبی موسڵ کە چاویان بە لیژنەی (عصبة الأمم) کەوت هاواریان کرد بژی تورکیا[١٠٢]، لە راپۆرتی ویلایەتی موسڵ باس لەوە دەکا کە عەرەب هەستی نەتەوەیی زۆر لاوازە لەو ناوچەیە، کوردایەتی بەهێز بووە، ئەگەر عروبیش هەبوایە ئەوا رایان لەگەڵ تورکیا بووە نەك عێراق[١٠٣]، بۆیە ئەگەر بەهۆی عەرەب بوایە ئەو ویلایەتە نەدەخرایە سەر عێراق، هەروەك دۆڕاندنی ئەسکەندرونە بۆ تورکیاو فەلەستینیش بۆ ئیسرائیل..

*** سنووری خواروی ناوچە دابڕاوەکان:**

سنووری خواروی ناوچە دابڕاوەکان هەر هەمان سنووری خواروی کوردستانە لەو سەردەمە، هەرچەندە ئەگەر قووڵ بینەوە بۆ مێژوو سنووری خواروی کوردستان ئەوە نییە ئەوەی ئێستای سنووری خواروی ناوچە دابڕاوەکانە، بەڵکو زۆر فراوانترە، خراپ نییە سنوورە فراوانەکەش باس بکەین بۆ ئەوەی ئەو سنوورەی ئێستای ناوچە دابڕاوەکان مسۆگەر بێت، ئەگەر سنووری خوارووش دیاریکرا کە کوردستانییە، ناوچە دابڕاوەکانیش کەوتە ئەو سنوورە، ئەوا ئەو ناوچانە کوردستانی دەبێت بەپێی بەڵگەنامە مێژوویی و جوگرافی و سیاسی و یاسایی و رەگەزی.. کە لە کۆتاییدا بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکان پێکدەهێنێت، ئەوەش هەنگاو بە هەنگاو بۆی دەچین جارێ لە پێشدا بزانین ئەو دوو ناوچەیە هەر پێکەوە بوونە یان لێك جیابووبونە.

**جیایی کوردستان و عێراقی عەرەبی:**

هەرچەندە کوردستان وعێراقی عەرەبی سنووریان لەسەریەکتر نەبووە تایەکیان سەر بەوی تر بێت، بەڵام بۆ زیاتر ساغ بوونەوە ئەو بەڵگانە تۆماردەکەین:

أ/ جیاییان لەناوو رەچەڵەکی جوگرافیدا: ئەو ناوچەیەوتەواوی کوردستانی ئێستاڵە کۆندا سەر بە (اقليم الجبال)، (بلاد الاكراد)، (ویلایەتی شارەزوور) و بەشێکی(عراق العجم) بووە، لەدوای گەشەی زاراوەی کوردستان لە رووی سیاسی ئەو ناوچەیەو زیاتریشی گرتووەتەوە، بەڵام لەرووی ئیداری سەر بە ویلایەتی موسڵ بووە لەدوای ساڵی ١٨٧٩.

ب/ جیاییان لە ئینتمای ئیقلیمیدا: لە چوارچێوەی ئەو دابەشییەی جیهان بۆ (٧)ئیقلیم لەلایەن جوگرافیاناسەکانی کۆن[١٠٤]، ئەو ناوچەیە (کەرکوك و تا خواروی موسڵ) و کوردستانی ئێستا سەر بە ئیقلیمی(٤) بووە، کەچی عێراقی عەرەبی سەر بە ئیقلیمی (٣) بووە.

پ/ جیاییان لەهێڵ و بورجەکانەوە:کوردستان بەو ناوچەیەشەوە لە بورجی(گا -الثور)ە کەچی عێراقی عەرەبی لە بورجی(دووپشك-عقرب) ە، بەغداش لە بورجی(قوس) بووە[١٠٥]. کۆ ئۆردینەیتی گەردوونی کوردستان دیسان جیایە لەگەڵ عێراق وشوێنی تایبەتی خۆی هەیە بریتییە لە:درێژی٤١-٥١پلە، پانییەکەشی ٣٠-٤٠پلە، لەسەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی عێراقە (لە سەرەتای سەدەی بیستەم) نامەی سوورەییا بەدرخان بۆ سەرۆکی کۆنفرانسی ئاشتی سنووری خوارووی کوردستانی لەسەرهێڵی ٣٤ دیاریکردووە، سەرووش بۆ هێڵی ٣٩[١٠٦]، (فۆرستەر)یش هێڵی پانی٣٤ی بۆ سنووری سەرووی عێراق دیاریکردووە[١٠٧]، کەچی عێراق لە خوارووی هێڵی ٣٤ تاکەنداو.

بەوشێوەیە لە ئینتمای ئیقلیمی و مێژوویی و جوگرافیایی و پلەکانی سروشتی و گەردوونی و..لێك جیابوونە.

ت-جیاییان لە روانگەی جوگرافی ناسە ئیسلامییەکان:

جوگرافی ناسە بەناوبانگەکانی ئیسلامی وەك(بەلخی، ئیستاخاری، ابن حوقل، المقدسی..) جیهانی ئیسلامیان لەسەردەمی خەلافەت بۆ ٢٠ ئیقلیم دابەش کردبوو، کوردستان (بەو ناوچە ناکۆکانەشەوە) سەر بە ئیقلیمی جبال بووە، هەرچی عراقی عەرەبییە سەر بە (ارض جزیرة) بووە[١٠٨].

ج- جیاییان لە سەر نەخشە کۆنەکان: لە نەخشە بەناوبانگەکەی ئیبن حۆقل (صورة الأرض) بە روونی اقلیم الجبال ومصایف الأکراد لەگەڵ عێراق لێك جیان چ جای عێراقی عەرەبی.هەروەها لە نەخشەی ئیساك تیریۆنی هۆڵەندی کە لە ساڵی ١٧٩٠ز گیراوە، لەو نەخشەیەدا کوردستان لەگەڵ عێراقی عەرەبی بەجیا هاتووە. لە هەردوو نەخشەی عوسمانی بەشی ئاسیای ساڵانی ١٨٩٣ و١٨٩٦، جگە لەوانەش باقی نەخشەکان عێراقی عەرەبییان لەگەڵ کوردستان بە شێوەی ئیقلیمی جبال یان جزیرە لێك کردووەتەوە.

چ-جیاییان بەپێی یاسای نێودەوڵەتی: ئەو لێك جیاییە بەردەوام بووە لە سەردەمی عوسمانی و تا دابەشی رۆژهەلاتی ناوەراستیش لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم(١٩١٤-١٩١٨)، کەبەپێی رێکەوتنامەی سیڤەر دابەشکران، لەکاتێکدا کوردستان بەپێی ماددەکانی (٦٣) جیابۆوە کەچی عێراق بەپێی ماددەی (٩٤)جیابۆوە[١٠٩]، وڵاتانی عەرەبیش هەریەکە بەماددەی جیاجیا جیابوینەوە. لەکۆنگرەکانی ئاشتی و سان ریمۆ وهەرەدوایش سیڤەر بۆ جیاکردنەوەی کوردستان بەڵێننامە لە تورکیاو عوسمانی وەرگیرا بەپێی ماددەی (٦٤)هیچ بەڵێننامەیەك لە عێراق وەرنەگیراوە بۆ سەربەخۆیی کوردستان، بەڵکو عێراق خۆشی پێویستی بە رازی بوونی عوسمانی بوو وبەوپێیە عێراقیش بەپێی ماددەی ١٣٢رەزامەندی بۆ وەرگیرا، ئەوەش روونترین بەڵگەی یاسایی نێودەوڵەتییە کە کوردستان یان ویلایەتی موسڵ یان ناوچە ناکۆکەکانی ئێستا سەر بە عێراق نەبوونە.

ح-جیاییان لە سیستەمی ئینتداب: عێراق و سووریا و وڵاتانی تر پاڵێوراو بوون بۆ دەوڵەت لەرێی ئینتداب کە لە ماددەی (٢٢)ی کۆمەڵەی نەتەوەکان بە سێ پۆلی (A، B، C) دیاریکرابوو، عێراق لەپۆلی (A) بوو، بەڵام کوردستان لەبەر پێگەیشتنی و بوونی دەسەڵاتی سیاسی و هەرێمێکی دیاریکراو بەناوی (کوردستان) هەروەك لە سیڤەریش بە ئەدرێسێکی سەربەخۆ لەبەشی سێیەم هات بێ ئینتداب، سنوورەکەشی دیاربوو.. ئەوا پێویستی بە ئینتداب نەبووە.

خ- روون ترین جیاوازی لەنێوان کوردستان و عێراق لە پرسیارێکی راپۆرتی ویلایەتی موسڵ ص١٦٧ دەپرسێ (لە چوارچێوەی ئەو ٣ پرسیارەی لیژنەکە بۆ بەریتانی ناردویە لە پرسیاری سێیەم هاتووە ئایا لەنێوان بەریتانیا چەند بەڵگەنامەی لە بارەی بازرگانی نێوان کوردستان و عێراق هەیە؟ واتە ئەوەندە جیا بوونە بەدوای بەڵگەنامەی بازرگانی گەراون.

د- جیاییان لە مێژووجوگرافیا(واقعدا):لە مێژوودا پێکەوە نەبوونە زیاتر لەوەلەرووی جوگرافیش سنووریان لەسەر یەك نەبووە بەڵکو ئیقلیمەکیان لەنێوان بووە، بۆ ئەو مەبەستە روون ترین نەخشەی کۆن کە کوردستان وعێراقی عەرەبی لە سەر بێت بریتییە لەنەخشەی(حمدالله بن مستوفی ١٣٣٩ز) دەردەکەوێت چۆن ئیقلیمێکیان لەنێوانە.

هەندێك لە نووسەرو مێژوونووسی کوردی ئەو جیاوازییانە بۆ ئەودیوتر دەباو دەڵێ ئێمەو ئەوان لە ئاو و هەوا و گڵ و جۆری زەمین و رووەك و.. هەمووی لێك جیاین[١١٠] ئەوەش لەوە دێت کەهیچ متمانەیەك نەماوە دەیەوێ لە شەری دوورکەوێتەوە، ئەگینا جیاوازی ئاووهەواو ژینگەو ڤاکتەرەکانی تری جوگرافی وجیۆلۆجی ئەوەندە پەیوەندی بە نەژادو توخم نییە وەك فەیلەسوفەکانی سەدەی ١٨ و١٩ لە فەرەنسا وای بۆچووبوون، ئینجا ئێمە لەگەڵ عەرەب براین ئەگەر ئەو کێشانە چارەسەر بکرێت.

***کامیان رەسەن ترە**

تەقەلایەکی زۆر دراوە ناوی عێراق لە قووڵای مێژوو بدۆزرێتەوە، لە(العراق في الخوارط القديمة)پەنای بۆ کۆنترین نەخشەی سەر زەوی کە لەسەردەمی سەرگۆن(٢٣٠٠پ ز) بردووە، کەچی بەووردبوونەوەیەکی سادە لەو نەخشەیە[١١١] دەردەکەوێ ناوی عێراقی لەسەر نییە تەنها بابل وئاشووری لەسەرە، کەچی بەشی (الجبال) لە سەرووی بابل و بلاد اشور دیاریکراوە.، بەڵام ئەگەر کەمێك بلاد ئاشوور بەو پلەیە بۆ عێراق ببنە پاڵپشتی جوگرافی بۆ رەسەنەیاتی ئەوا (جبال) دە هێندە دەبێتە پاڵپشت بۆ کوردستان، چونکە عێراق زادەی چالاکی زێدی باپیرانی عەجەمە، کەچی جبال تا ئەو دواییەش گوزارشێکی روونی چالاکی کۆمەڵایەتی و ئیداری وسیاسی کوردە، لە نەخشەی ئیبن حۆقل زۆر بە روونی عراق و(دیار العرب) لێك جیا کرایەتەوە، لە نەخشەی (ئێراتۆتینیس ١٩٦ پ م) هیرۆدۆتس(نیوەی سەدەی ٥ پ ز)ناوی (میدیا)ی لەسەرە، (بلاد العرب)یش لە جزیرەی عەرەبی ئێستا دیاریکراوە[١١٢]، بەدەگمەن نەخشەیەکی کۆنی بیانی وئیسلامی نادۆزییەوە یان کوردستان یان بلاد جزیرە یان بلاد الجبالی لەسەر نەبێ.

ناوی عێراقیش کۆنە، بەڵام لەپەیوەندی بە عەرەب لاوازە، واتە گوزارش لە عروبییەتی خاکەکەی ناکا، خۆی ناوێکی عەجەمیەو موڵکی فارس بووە، بەکورتی گوزارش لە پەیوەندییەکی یاسایی، سیاسی و مێژوویی نێوان (هەرێم وگەل ودەسەڵاتی) عەرەبی ناکا، کە یەکێکە لە مەرجە هەرە بنچینەیی دەوڵەتی رەسەن بەپێی یاسای نێودەوڵەتی، دووبارە بەپێی چالاکی ئیداری و سیاسی و یاسای میللەتی عەرەب ئەو ناوە نەهاتووەتە کایەوە، ئەگەر چالاکییەك لەو شێوەیە لە مێژووبەدی بکرێ زیاتر لە هەمووان گوزارشی لە شانۆیەکی فارس کردووە، بۆیەش دەبینین لەرێکەوتنامەنێودەوڵەتییەکان سەبارەت بە عێراقیش ئەو ناوە نەهاتووە تالەلۆزانی ١٩٢٣ بۆ یەکەم جار لە ماددەی (٣) دوو جار هاتووە، بەڵکو کیرزۆنی بەریتانیا ناوی عێراقی زیندوو کردەوە لەجیاتی میزۆپۆتامیای عەرەبی[١١٣].

هەرچی کوردستانە ناوێکە رێك گوزارش لەو پەیوەندییە

دەکا، ئینجا سەرباری ئەوەش ناوی کوردستان لەدوای دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرن بە بڕیار نەهاتووەتە کایەوە، بەڵکو لە ئەنجامی چالاکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئیداری و یاسایی مێژوویی کورد هاتووەتە کایەوە، بۆیە ڕەسەنایەتی کوردستان بۆ ناسنامەی نەتەوایەتی زۆر بە هێزترە لە زۆربەی وڵات و نیشتمانانی دەوروبەر، ڕەسەنایەتی کوردستان و گوزارشی یاسایی و سیاسی ناوەکەی بۆئەو خاڵانەی خوارەوە دەگەڕێتەوە:

ا- ئەو ناوە لە خودی کوردستان هەڵقوڵاوە، ئەگەر دەڵێن سوڵتان سنجاری سەلجوقی (سەدەی ٥-٦ه)ئەوناوەی بەرپا کردووە زۆر دروست نییە، سەرچاوەی ئەو زانیارییە یەکەم جار لەلای (کی لیسترینگ) لەکۆتای سەدەی ١٩ لە کتێبی (بلدان الخلافه الشرقیه ص٢٢٧) ئاوا بڵاوکردەوە: هەر ئەویش دەڵێت یەکەم جار لە نووسینی فەرمی لەکتێبی (نزهة القلوب) ی حمدالله مستوفی(٧٤٠ك) المستوفی لە سەدەی ١٢ هاتووە و وەسفی کوردستانی بە ١٦ هەرێم کردووە، محەمەد ئەمین زەکیش لەوانی گواستەوەو بووە ڕاستییەکی مێژوویی، ڕاستییەکەی پێش ئەویش ئەوناوە هەبووە (سوڵتان سنجار) پەرەی پێداوە لە ناوێکی میللی جوگرافی بۆ ناوێکی ئیداری، لە شیعرو پەند ناوی کوردستان پێش ئەو مێژوە دۆزراونەتەوە، لە ڕێنماییەکی (شێخ ئادی بن مسافر الحكاري) بە نازناوی (شرف الدين) هاتووە:

شەرەفەدین میر ل دیوانی
خەبەری بدەنە کوردستانی
بلا قایم بکن ئیمانی[114]

(رشید فضل الله)ی مێژوونووسی مەغۆل لە(جامع التواريخ)پێش ئەو بەرواره باسی کوردستانی کردووە، لە سەرچاوەکانی فارسیش پێش ئەو بەرواره ناوی کوردستان هاتووە.

ب-ئەو ناوە گوزارش لەشوێنی کوردان دەکا، لەچوارچێوەی کۆمەڵێك ناوی وەك (اقليم الجبال) [115]، (اقليم الجزيره)، (شهرزور)، (میزۆپۆتامیا)... لەدوای سەدەی١٢ناوی کوردستان بەرەبەرە بەرەو زاڵ بوون دەچوو، یەکەم جار لەرۆژهەڵاتی کوردستانی ئێستا، دوای بەرەوسەرەوو، لە سەدەی ١٧ش بەتەواوی کەوتە نێو فەرهەنگی عوسمانی، ئینجا خوارووش، بەوشێوەیە لەگەڵ ڕابوونی هەستی نەتەوایەتی لە جیهانی ئیسلامیدا لە کۆتایی سەدەی ١٩ دەرکەوتنی پەیوەندی ناسنامەیی لەنێوان ناوی وڵات ومیللەت، ئەوا ناوی کوردستان جێی ئیقلیم جەزیرەو ئیقلیم جبال و میزۆپۆتامیای گرتەوە.

پ- لقی ب بریتییە لە گەشەی ئاسۆیی ناوی کوردستان و پانتایی جوگرافییەکەی، ئێستا باسی گەشەی ستوونی ناوی کوردستان دەکەین لە ناوێکی میللی دەڤەری بۆ ناوێکی ئیداری لە سەدەی ١٢، لە سەدەی ١٧ش بووە ناوێکی ئیداری عوسمانی، لەکۆتایی سەدەی بیستەم بووە ویلایەتێکی فەرمی عوسمانی و بەو شێوەیە لە ئیداری گەشەی کرد بۆ سیاسی، ولەنەخشە جوگرافی وئیدارییەکان پەڕییەوە بۆ نەخشەی سیاسیش[116]، لە ڕێکەوتنامەی سیڤەری ١٩٢٠ بووە ناوێکی یاسایش کاتێ لە بەشی سێیەمی بە ئەدرێسێکی سەربەخۆ تۆمارکرا.بەو شێوەیە کوردستان لەسەرەتای سەرهەڵدانی دەوڵەتی نەتەوەیی و مۆدێرن قۆناغەکانی جوگرافی و ئیداری و سیاسی و یاسایی پێش تورکیا و عێراق و سووریا و ئوردەن و زۆربەی ناوە یاساییەکانی ئێستای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بڕی (جگە لە ئێران نەبێت).

ئێستاهەر لە قۆناغی ساغ کردنەوەین لە سەروو ناوی ڕەسەنی کوردستانمان وسنووری سەرووی عێراق و جیاییمان لەگەڵ یەکتر ساغ کردەوە، ئێستا بەرەو ئەوە دەچین کە سنووری خوارووی کوردستان و(ناوچە دابڕاوەکان)ڕاستەوخۆ دیاری بکەین، لە پێشدا بەرەو ئەو بەڵگەنامانە دەچین کە سنووری کوردستان زۆر لە خوار ئەو ناوچانە بوونە کەئێستا ناکۆکی لەسەرە.

***ئەو بەڵگەنامانەی موسڵ تا بەغداش بەکوردستان هەژمار دەکەن:**

ئەو بەڵگەنامانە دەگەڕێتەوە بۆ پێش دروستبوونی عێراق و پێش سەردەمی مەرکەزی عوسمانی کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزەهەم دەستپێدەکا، بەو شێوەیە لە خوارەوەیە:

١- بەپێی (آثار البلاد واخبار العباد-قزويني ص٢٨٣) لە ماددەی: اقليم الرابع موسڵ و بەغداش وەك باقی کوردستان سەر بە ئەو ئیقلیمە پۆلین دەکا، لە کاتێکدا عێراقی عەرەبی سەر بە ئیقلیمی سێیە، هەروەها لە هەموو مەعجەم و گەڕیدەو جوگرافی ناسەکان بەغدا سەر بە عێراقی عەرەبی نەبووە بەڵکو سەر بە ئیقلیمی عەجەمی(فارسی یان کوردی) بووە.

٢- لە(ج١ معجم البلدان) لەبابی إيراهستان: باس لە سەرجەلەی ناوی عێراق دەکا و دەڵێ لە (ئێراه) هاتووە و دەشیبەستێتەوە بە ئەردەشێر، ئەردەشێریش کوردە، کەواتە بەپێی بەشێك لە پسپۆر لە کوردۆلۆجی ئەوا ئەو ناوچەیە و بەغداو خوارووشی زیاتر موڵکی کوردە لەنەتەوەکانی تر.

٣- بەپێی هەندێ سەرچاوەی کوردی ناوی بەغدا کوردییە دەگەڕێتەوە بۆ دوو ووشە:باغ +داد بۆیە لەسەردەمی ئەبو جەعفەری مەنسوور ناوەکەی گۆڕی بۆ مدينه السلام (دوایش بۆ مدينة المنصورة). لەوەش ڕوونتر یاقووت حەمەوی دەڵێت:- اصل بغداد للأعاجم[117].

٤-ئەرشاك سافراستیان لە (الكرد وكردستان ص٦٥)دەڵێ بەغدا زێدی ڕەسەنی کوردانە.

٥- لە دەورووبەری بەغدا ئەو دەسەڵات و میرنشین و دەوڵەتە دەڤەرییانەی دروست بووبێت زیاتر کوردبوونە، جگە لە دەوڵەتی حەسنەوی کورد لە ڕۆژهەڵاتی بەغدا بەرەو سەروو ئەوا دەسەڵاتێکی تری گرنگی کورد لە ئەهوارەکان و خوارووی بەغدا دروست بووە بەناوی (شاهینە) بەناوی (عمران بن شاهين لە ٣٣٨ك بەرامبەر ٩٤٠ز) ناوبانگی پەیدا بوو[118]. هەموو گەڕیدەکان کەرکوکییەتی کوردستان دەسەلمێنن، سەردانی ڕێچ بۆ کوردستان هەر لە بەغدا دەردەچی مێوانی حاجی عەبدوڵڵا دەبێ ئیتر بەولاوە و بە دیالە و دووزو کەرکوك ڕەت دەبێ بە سەفەر بۆ کوردستانی

تۆمار کردووە.

٦- لە نامەیەکی والی بەغدا بۆ سەرۆك وەزیرانی عوسمانی(سەدری ئەعزەم) لە بەرواری ٢٨ی مایسی ساڵی١٨٤٧ چەند جارێك دووبارەی دەکاتەوەو دەڵێ دەورو بەری بەغدا هەمووی کوردن[١١٩].

٧- لەوەش زیاتر ئیبن بەتووتە دەوروبەری بەسراش بەکورد وەسف دەکاو دەڵێ کاتێ لە بەسرە بەرەو ئەسفەهان ڕۆیشتم لەڕێ لامدا میوانی هۆزە کوردەکان بووم. لە بەڵگەنامەیەکی بەریتانی کە تیایدا باڵوێزی لە بەغدا (کانسیری) زانیاری لە بارەی ڕووداوەکانی کوردستان دەنێرێ و سنووری باشووری بۆ نزیك (محەمەرە) دەستنیشان دەکا و زیاتر لەوەش ئەو زانیارییە لە بەرپرسێکی گەورەی حکومەتی عێراق دەگوازێتەوە[١٢٠].

٨- یاقوت حەمەوی وزۆر سەرچاوەی تر لەباسی(حلە) باس لە کێشەیەك دەکەن لەنێوان کوردو ئەهلی (جامعین)، لەدەرەوەی حلەش هەبوونە، بەڵام نازانرێ ناسنامەی جامعین چیە، بەڵام باسی عەرەبی لێنییە.

لەدوای ئەوانە واتە بۆ نزیکی سەدەی بیستەم گەریدەو جوگرافی ناسەکان لە بەغدا بەرەو سەروو بۆ لای حەمرین وموسڵ لەسەرکوردستان تۆمارکراوە، وەك ئەوانەی خوارەوە[١٢١].

٩- کۆتلۆف وای دیاریکردووە: هەردوو ڕۆخی دیجلەو فورات تا دەگاتە دەوروبەری بەغدا، عێراقە. هەرچی سەرووی بەغدایە ئەوە سنووری کوردستانی خوارووە.

١٠- لە کتێبی (عباس العزاوي-عشائر العراق) و لە کتێبێکی تری لەسەر کوردە فەیلییەکان باسی لە بوونی کورد لە خوارووی بەغدا بە چڕی دەکا، ناوی زۆربەی عەشیرەتەکانی بردووە کە کوردن، ئێمە لە کتێبێکی عەرەبی بەناوی (الإسلام والعلمانية واثرهما في نشأة الدولة العراقية الحديثة) بە ووردی باسی سەرکردەو هەیئەکانی شۆڕشی بیستمان کردووە جگە لە چەند کەسێك نەبێت بە دەگمەن عەرەبی تیا نییە، ئێستا لەو سەرچاوەو سەرچاوەی تر باس لەوە دەکەن عەشیرەتە کوردەکان لە خواروو پێشڕەوی ئەو شۆڕشە بوونە، بۆ ئەو مەبەستە زیاتر بڕوانە:- (مذكرات برترام توماس -الحاكم السياسي البريطاني في منطقة الناصرية بين سنتي ١٩١٨-١٩٢٠) (محمد جميل روژبياني) لە کتێبی (اربع دول كوردية) هەروەها(مصطفى جواد)(جاوان العشيرة الكوردية المنسية).

١١-زۆربەی سەرچاوە کۆنەکان باسی پێکهاتەی بەغدا ئەگەر کردبێ ووتویانە پێکهاتووە لە جوولەکەو کوردو عەرەب وفارس، فۆرستەر دەڵێت:- سێیەکی بەغدا جوولەکەن[١٢٢]، تا ئەو ڕادەیە لە شاری بەغدا لە جیاتی هەینی ڕۆژی شەممە پشوو بووە[١٢٣]، لە ساڵی١٩٠٠زاینی نوێنەری بەغدا بۆ (مەبعوسان-پەرلەمانی عوسمانی) هەڵبژێردرا ٣ کەس دیاریکران:- ئیسماعیل حەقی بابان(کورد)، ساسۆن حسقيل (جوولەکە) و مەحمودئالوسی (بە عەرەب تۆمارکراوە، بەڵام لەوەش گومان هەیە)، حنا بەتاتۆ ناوی ٢٠ لە یەکەمە موڵکدارەکانی ساڵی ١٨٩٤ی بەغدای کردووەتە خشتەیەك تەنها دوانیان عەرەبن[١٢٤].

١٢-ڕۆژهەڵاتناس (نۆرمان) لە کتێبی(تأريخ الشرق القديم): دەڵێت ماڵە کوردەکان بە بەرفراوانی هەنە، هەر لە کەنداوی عەجەم(بەسرە) تا دەریای قەزوین و دەریای ڕەش و دەریای سپی و بەرەو ئەسکەندەروونە و بە ئاراستەی موسڵ تا دەگاتەوە ڕۆژهەڵاتی بەغدا.

١٣- لە(بلدان الخلافه الشرقيه ص١١٦) دەڵێت موسڵ لە سەدەی(١٠) هەمووی کورد بوون، ئیبن حۆقلیش هەروا دەڵێت و گەرەکەکانیشیان بە ناوی: لاری وهەزبانی و حەمیدی بوونە. .

١٤- لە ڕێکەوتنی ئەرزەڕۆم کە لە٢٨ی تەمووزی ساڵی١٨٢٣بەسترا، پێکهاتووە لە (٧) بەش- لەبەشی یەکەم باس لە کوردستان دەکات و دەڵێ سنووری دەگاتە نزیك بەغدا[١٢٥].

١٥- بلازری(٢٧٩ ھ) لە"فتوح البلدان ص٤٠٧" دەڵێ لە شاری موسڵ کوردەکان شەڕی سوپای ئیسلامیان کرد لە(٦٣٧ز)، دەڵێ ئەو شارە لەپێش فەتح تەنها دوو گەرەك بوو، لە گەرەکەکیان کوردە ئاگرپەرستەکانی لێبوو، ئەوانی تریش مەسیحی بوون. هەریەکە لە ئێستاخاری و ئیبنوئەسیر (١١٦٠- ١٢٣٣)م وایان گێڕایتەوە.

١٦- هەریەکە لە تەبەری (٨٣٨- ٩٢٣)م. مسعودی (٨٩٦-٩٧٥)م. حەمەوی (١١٧٨)م. ئیبن خردازبة (٨٢٠- ٩١٢) م. ئیبن خەلدوون (١٤٠٦)م. ئیبن خەلەکان (١٢١١-١٢٨٢) م. وئیبن حوقل (٩٧٧ م) دەڵێن زۆر لە مێژە کورد لە موسڵ و دەوروبەری جێگیر بوونە چەندین گەرەکیشیان لە ناو موسڵ هەیە، لەلایەکی تریشەوەلەگەڵ ئیبن بەتووتە (١٣٠٤-١٣٧٧)م هاوران کە لە (رحلة ابن بطوطة) دەڵێت:- (إن مدن موصل وماردين و سنجار هي مدن كوردية). لە ص٧٤ی ڕاپۆرتی ولایە الموصل لە چوارچێوەی بەڵگەکانی بەریتانیا کە لە قازانجی عێراق و عەرەب بووە کەچی لەوێش ناوی نەینەوا بە نەینەوای کوردستان دەبا.

١٧-مەقریزی لە(السلوك والمعرفه دوله الملوك)، (معجم البلدان) دانیشتووانی موسڵ بە زۆرایەتی دانیشتووانی عەشایرە کوردەکان وەسف دەکا. چەلەبی زادەی بەغدادیش لە (كشف الظنون-١٦٣٨) دووپاتی ئەوراستیانە دەکاتەوە. (کۆن هامەر)ی ئەڵمانی ڕۆژهەڵاتناس لە (تأريخ الدولة العثمانية ج٤ص٢٨) دەڵێ: دانیشتووانی موسڵ زۆربەی کوردن کەمێکی عەرەبیشی لێیە.

١٨- لە(دائیرەی معارفی فەرەنسی) دەڵێ جەزیرە و موسڵ و کەرکوك و هەولێر و سلێمانی و ڕانییە و کفری یەك ئیقلیمی سەربەخۆ پێکدەهێنن.

١٩- لە(عجائب البلدان- لسراج الدين ابن الوردي -مادة: ارض الجزيرة): لە وەسفی (جزيره ابن عمر) دەڵێت: (وتشتمل على ديار ربيعة ومضر، وتسمى ديار بكر، وهي ما بين دجلة والفورات وكلها تسمى بالجزيرة، وبها مدن وقرى عامرة. ومن مدنها المشهورة الموصل).

٢٠- الإمام الذهبي لە(العبر في خبر من غبر) و لە زۆر سەرچاوەی مێژوویی ئیسلامی تر باس لەوە دەکرێ جارێکیان گەلە دزێکی کورد بەغدایان داگیر کردووە، ئەوەش مانای ئەوەیە

ئەگەر بەغدا کوردیش نەبووبێ ئەوا ئەوەندە لەژێر ڕکێفی کورد دوور نەبووە.

٢١- جوگرافی ناسی گەورەی عوسمانی شمس الدین سامی لە (قاموس الأعلام) لە(مادده: کەرکوك) دەڵێت سەر بەولایەی موسڵە، بەڵام بەوەش ناوەستێ دەڵێ ویلایەتی موسڵی کوردستان، واتە نەك کەرکوك ویلایەتی موسڵ تەوای کوردستانییە.

٢٢- مندوب السامي البريطاني- همفريز الوثائق السرية- بغداد ١٩٢٩/٤/٢٣

...لەو بەڵگەنامەیە باس لەو ناوچەیەی ئێستا ناوی نراوە(مناطق متنازع عليها)دەکا داوا دەکا زمانی فەرمی ئەو ناوچەیە کوردی بێت چونکە کوردن، لە کۆتایی بەڵگەنامەکە خشتەیەکی دانیشتووانی دەرەوەی موسڵ٧٠٪ی کوردن، بەڵام باسی ناو موسڵی نەکردووە.

لە بەڵگەنامەیەکی تر ١٦١ /٧٣٠ CO/٢ سکان کردستان: شاری دیالە بەکورد پێشان دەدا:.. واذا اجريت احصاء دقيق ولم يحسب الكرد ضمن عرب السنة يكون عدد الكرد والعرب متساويا. فمثلا تم تجاهل عدد الكرد في لواء ديالة ذات الاغلبية الكردية والاقضية الكردية في كوت في الاحصاءات السابقة[١٢٦].

٢٣- موسڵ لە بەڵێننامەکانی عێراق بۆ (عصبة الأمم): بۆ ئەوەی عێراق لە عوسبە وەرگیرێ ١٠ بەڵێننامەی دا، لە بەڵێننامەی ژ:٩ لقی١ تیایدا بەڵێن بە(عصبە)دەدات کە زمانی کوردی لە موسڵیش فەرمی دەبێت.

٢٤-(تقريرلجنة عصبة الأمم الخاصة بحل النزاع التركي البريطاني حولة ولاية الموصل): ل٢١٩ دەڵێ عێراق هیچ مافێکی لەوناوچەیە(ویلایەتی موسڵ) نییەو ناوی عێراقیان هەرنەبیستوە، لەل١٥٣ دەڵێ نێوان موسڵ وبەغدا هیچ ناوێکی دیاریکراوی نەبووە، لەل٢١٨ ڕاستەوخۆ تردەڵێ ویلایەتی موسڵ کوردییە، هەر لەو ڕاپۆرتە دەڵێ شەریف پاشای کورد لە ساڵی ١٩١٩داوای تەواوی ویلایەتی موسڵی کردووەتەوە بەپاڵپشت بە هەردوو(دائرەی معارفی بەریتانی وفەرەنسی)، هەر لەو ڕاپۆرتە لە ل١٥٩باس لەوە دەکا کە لە سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی(١٥٣٤)و دواتریش بەغداو موسڵ و کەرکوك بە ولایەتی شارەزوور ناوزەد دەکرا.

٢٥ - لە (معجم البلدان- حەمەوی- ج٢ ص١٣٤-١٣٥) لە ڕاڤەی (جزیرە ئاقور) -جزیرەی ئیبن عومەر هاتووە: بين دجلة والفورات، من امهات مدنها حران، الرخة، راس العين، نصبين، سنجار، خابور، آمد، ميافارقين، الموصل.

٢٦ - لە قاموس السياسي-احمد عطية الله کە لە ساڵی ١٩٦١ دەرچووە -لە بابەتی کوردستان ص٩٦٨ شارەکانی کوردستان ڕیز کردووە موسڵیشی بەگەر خستووە.

٢٧_ بەبۆنەی توێژینەوە لە ماددەکانی ٦٢ و٦٣ و٦٤ی سیڤەر سەبارەت بەکوردستان مێژوونووسی عەرەب عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی دەڵێت: لێرەوە بیری خەملینی دەولەتێکی کوردستانی سەربەخۆ خەملی بۆ هەر (٥)لیوای کوردی:(سلێمانی، هەولێر دیالە، کەرکوك، موسڵ)[١٢٧].

٢٨- نەخشەی ئیساك تیریۆنی هۆڵەندی دەگەڕێتەوە بۆساڵی١٧٩٠ز، لەو نەخشەیەدا ناوی شارەکانی کوردستانی لێ تۆمارکردووە، لەوانە: شاری عەمادییە، ئەربیلا، شوێنەواری نەینەوا، تەبلیس. .

٢٩ - لە نەخشەی سایکس بیکۆش تەنها بەغداو بەسرەی بە میزۆپۆتامیای خوارو دیاریکرد.

*** سنووری ناوچە دابڕێنراوەکانی( لە موسڵ تا کەرکوك ):-**

**١- سنووری خوارووی ناوچە دابڕاوەکان بەپێی -بەڵگەنامە ئیسلامییەکان:**

أ- لەخوارووی (جبل حەمرین) ناوی جیاجیای وەك (بلاد بابل، بلاد سومر، عراقی عەرەبی، عراقی عەجەمی، بلاد مابين النهرين الجنوبيه، میزۆپۆتاميا العربيه، سواد، منتفك، . . . کە دوای عێراقی عەرەبی لێ پێکهات، هەرچی لە سەرووی جبل حەمرین ئەو ناوانەی هەڵگرتوە: ئیقلیم جبال، بلاد الاكراد، میزۆپۆتاميا، جزيره ابن عمر، کوردستان، بلاد شهرزور... دوایی کوردستانی گەورەی لێ خەملی.

ب- زۆربەی جوگرافی ناسە کوردەکان پێیان وایە ئیبن خەلدوون ناوی (جبل حەمرین) بە جبل الاكراد دەبا ئەوە دەقەکەیەتی:..إلى الإقليم الرابع وفيها هنالك بلد المراغة في شرقي جبل الأكراد المسمي بأرمي وقد مر ذكره في الجزء السادس[١٢٨]..

پ- لە زۆربەی سەرچاوە ئیسلامییەکان باس لەوە دەکەن کە لە٦٤٠زئیمامی عومەر فەرمانی بە (عتبە بن فرقد) کرد موسڵ ڕزگار بکات، پێی ووت خەڵکی موسڵ سمێل گەورەو پرچ درێژن زمانیان عەرەبی نییە...مەبەستی ئێزیدییەکان بووە، بلازەری لە(فتح البلدان) وئیبن ئەسیر(١١٦٠- ١٢٣٣)م لە(کامل في التاريخ)دەڵێ:- لەو هێرشەدا بووە شەریان لەگەڵ کوردی نەینەوا. ئەوەش بەڵگەی کورد بوونی ئەو ناوچە و زیاتریشە.

ت- بلازری(٢٧٩ ه) لە"فتوح البلدان ص٤٠٧" لەو کتێبە باسی گرتنی شاری موسڵ دەکا لەلایەن سوپای ئیسلام، کوردەکان شەڕیان کرد، دەڵێ ئەو شارە لەپێش فەتحی لە(٦٣٧) تەنها دوو گەرەك بوو، لە گەرەکەکیان زەردشتییە کوردەکان بوون، ئەوانی تریش مەسیحی بوون.

ج-هەریەکە لەو دوو سەرچاوەی سەروو (المسعودی ٨٩٦-٩٧٥)م. وطبری٨٣٨- ٩٢٣)م دەڵێن لە ٧٧٥زکورد لە موسڵ لە عەباسییەکان ڕاپەڕین، جارێکی تر لە ٨٣٨ز بە سەرۆکایەتی (جعفر بن رجب الداسنی)و لە ٨٦٨ز بە سەرۆکایەتی (مساوار بن شاري الكوردي)و دوایش هەروەك ئیبن ئەسیر(١١٦٠- ١٢٣٣)م دەڵێت دەستیان بەسەر موسڵ داگرت لە سەردەمی (خليفە موعتەسەم).

چ- ئیبن خەلەکان لە کتێبی (وفيات الأعيان ص١٩٣) دەڵێ: لەسەردەمی سەرەتای ئیسلامەوە هەرناوی کەرکوك ڕاستەوخۆ بەندبووە بە (بلادشهرزور)، هەروەها دەڵێت: کەرکوك مەڵبەندی شارەزوور وزۆرمیرنشینی کوردی تربووە.

خ- لەچوارچێوەی ڕێکەوتنامەکەی بدلیسی سوڵتان لە ساڵی ١٥١٤. بەشێك لە میرنشینەکانی کورد لە کەرکوك بوونە وشێوەی فەرمییان وەرگرتووە بەهۆی ئەو ڕێکەوتنە،

لەسەردەمی سوڵتان موورادی سێیەم لەساڵی ١٥٨٣میرنشینی ئەردەڵان کەوتووەتە سەر ویلایەتی شارەزوور بە فەرمی، لە ساڵی١٦٩١ پایتەختی ئەردەڵان لە زەڵم گوازرایەوە بۆ کەرکوك، محەمەد ئەمین زەکی دەڵێت:- دوای ئەردەڵان کەرکوك کەوتە ژێر ئیدارەی سیاسی بابانەکان تا دیالە و خوارووی حەمرینیش بە فەرمی و یاساییانە فەرمان ڕەوا بوونە لە چوارچێوەی ڕێکەوتنەکە.

یەکەم والی و دەسەڵاتداری ئیالەی شارەزوور سەرکردەی ئەردەڵانی (بێگە بەگ)بووە، یەکەم فەرمانڕەوای سنجاقی کەرکوك مەئمون بەگی کوری بێگە بەگ بووە لە سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی هەر لە چوارچێوەی ڕێکەوتنامەکەی بدلیسی سوڵتان .

ح- حمدالله مستوفی(٧٤٠ك)[١٢٩] لە کتێبی (نزهت القلوب) بۆ یەکەم جار[١٣٠] باسی سنووری کوردستان دەکا و هێڵەکە لە کرماشانەوە بەرەو شارەزوور ودینەوەر دەکێشێ.

د- ئەولیا چەلەبی (١٠٦٥ك)ئەو سنوورەی خوارووی کوردستان بە ڕوونتر دەکێشێ لە موسڵەوە بەرەو بەسرە. دوای هەروەك لە (ولایە الموصل ص٧٣) باس لە (تقویم العثماني١٧٠٠)و(اطلس امبراطوریة العثمانیة ساڵی ١٩١٣ هەمان سنووری نێوان کوردستان و عێراقی وەك ئەولیا چەلەبی ونەخشەی عوسمانی ١٨٩٦ دەکێشێ.

**٢- سنووری خوارووی ناوچە دابڕاوەکان بە پێی گەڕیدەکان:**

گەڕیدەیەکی زۆر هاتوونە ئەو ناوچەیەو چیان بینیوە نووسیویانە.. هەندێکیان ئیسلامین و ئەوانی تریش بیانین:

أ- گەڕیدەکانی جیهانی ئیسلامی، لەوانە ئیبن بەتوتە ئەو ناوچانەی بە دانیشتوی کورد وەسف کردووە لە کتێبێك بەناوی (تحفة النضار في غرائب الامصار-ص٢٠٨) وە دەڵێ کە سەردانی ئەسفەهانم کرد لە ڕێگە پڕ بوو لە ڕەشماڵی ماڵە عەشایەرە کوردەکان، ئەوەش لەگەڵ ئەو بەڵگەنامەیەی بەریتانی (٣٢٩ WO/٢٨٦٩ بغداد٥/ شباط/١٩٥٩) دێتەوە کە باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا لە ڕاپۆرتێکیدا سنووری باشووری کوردستان بۆ نزیك کەنداو دەستنیشان دەکا، گەڕیدەیەکی تر شێخ ئەسفەهانی لە کتێبێك بەناوی (گەشتنامەی ئەسفەهانی بۆ شنۆ و ورمێ و ڕەواندوز) لەو گەشتەی زۆربە خراپی باسی کورد دەکا، بەڵام دیسان بەڵگەنامەی بەنرخی تیایە و تیایدا دەردەکەوێ دەسەڵاتی سیاسی و بازرگانی و کۆمەڵایەتی (ئیالەتی کوردستان) لە نزیك ورمێ تا موسڵی گرتووەتەوە، ئەو نەچووە بەلای کەرکوك زیاتر سەردانەکانی ئەو تەوەرەی گرتووەتەوە.

ب- قلقشندی لە (نهایە الارب في انساب العرب) دەڵێ کورد لە ٢٠ شوێن هەن، لەوانەش بلادکرخینی(کەرکوك) و داقوق[١٣١].

پ- ابن حوقل (٩٧٧ن)، یاقوت حەمەوی((١١٧٨)م)، ابن مهلهل(سەدەی٦)، قزوینی(سەدەی ١١)، ابوالفدا (٧٣٢ك بەرامبەر١٣٣١ن)، (ابن فضل العمري (١٣٠١-١٣٤٩ن)، ئیبن خەلدوون(١٤٠٦)ز، ئێستاخاری(-٣٤٦ك بەرامبەر٩٥٧ن). باسی کوردیان کردووە لەسەرووی جبل حەمرین[١٣٢]، بەڵام باسی عەرەب و تورکمانیان نەکردووە، هەموو ئەوانەش کە باسی شارەزووریان کردووە زۆربەی مەبەستیان کەرکوك بووە.

ت-منشی بغدادي بەدرەنگەوە سەردانی کەرکوکی کردووە لە ساڵی١٨٢٠دەڵێ خەڵکەکەی کورد بوون، دەڵێ لەدوای (جبل حەمرین) نۆرەی قسەکردن بەکوردی دێت.

ج- عباس عزاوی لە کتێبی (تأریخ الکاکائیە) لە(الجامع المختصر في عنوان التواریخ)ی نەقل کردووە دەڵێت حوکمی خەلیفە گەیشتە عێراقی عەرەبی و ئەسبەهان و دوایش گەیشتە کەرخینی (کەرکوك) لە (بلادکردستان).

**٣- گەڕیدە بیانییەکان**

ا- زەینفۆن لە کتێبەکەی(مسیرە عشرە الاف..) لە سەربردەی خۆیانی٤٣١پ ز لەگەڵ کورد باس لەوە دەکا ئەوان بە دۆڵی دیجلە ڕۆیشتوون بۆ بابل تەنها باسی عەشایەرە کوردەکانی کردووە لە موسل وجبل حەمرین، باسی عەرەبی نەکردووە. ئەو دۆخە بەردەوام بووە تا پاش خەلافەتی ئیسلام و ئەوەتا یاقوت حەمەوی لە (معجم البلدان) لە سەدەی ١١دەنووسێ لە بارەی بابل(حلە) لەوێ کێشەی بەردەوام لەنێوان کوردو (اهل الجامعین) هەبووە، عەرەبی تێدا نەبووە.

ب-ڕۆژئاواییەکانی دوای ڕابوون: ئەوانە گەلی زۆرن و بەدەگمەنیش سەرچاوەیەك نابینییەوە بڵێت کەرکوك کوردستانی نییە، بەڵکو بەشێکی زۆریان موسڵ و خوارووی جبل حەمرینیش بە کوردستان هەژمار کردووە، سەرەکییەکانیان تۆماردەکەین:- لیوناردو ڕالف لە ساڵی ١٥٧٤، میرزا ابو طالب-هیندی (رحلات في اسیا واوروبا وافریقا-١٧٧٩)، جاکسۆن[١٣٣] لە کتێبی (مشاهدات بریطاني لمسیبوتامیا-١٧٩٧)، ئۆریندۆپرییەی فەرەنسی(رحله من ایران-١٨٠٧)، جیمس بینگام (رحلات في بلاد مابین النهرین-١٨١٦) ڕۆبەرت کیربۆرتەر (رحلات في جورجیا وایران وارمینیا-١٨١٨)، جیمس ریچ لە١٨٢٠، ج شیل لە١٨٣٦، کارل ریتەرلە ١٨٤٤، مافرینز لە١٨٩٢، تا دەگاتە مارك سایکس (سفرة في ولایات الخمسة الترکیة-١٨٩٩)، فون هامري نەمساوی لە (تأریخ الدولة العثمانیة)[١٣٤] پانیزە لە ساڵی ١٩١١، مذکرات مسیودي فایریسین(من البلقان حتی برلین)، فورستر (نشأة الدولة العراقیة)، ... ئەوانە هەمووی سەردانی کەرکوکیان کردووە، کەسیان نەیوتووە کەرکوك کوردستانی نییە یان ووتویانە کوردن یان باسی ناسنامەی نەتەوەییان نەکردووە، بەڵام تیاشیادا هەیە دەڵێ موسڵ سەر بە (بلاد الأکراد)ە، لیۆنارد راوولفي هۆڵەندی لە ساڵی ١٥٧٥ز سەردانی موسڵی کردووە و دەڵێ: من ان الموصل تقع في بلاد الأکراد.

پ - لە یاداشتەکانی مەندوبی ئەڵمانیا لە عێراق (فریتز غروبا)لەنێوان(١٩٣٢ تا١٩٤٠) لە (العراق في المذکرات الدبلوماسین الأجانب). لە گفتوگۆکانیان لەگەڵ بەکر سدقی وا باسی کەرکوك دەکەن کە مەڵبەندی کوردستانە.

ت- ئەندازیاری ڕووسی (یوسیب گەرنیك)لە ١٨٧٢ بۆ ١٨٧٣ هاتووەتە کەرکوك لە(ج٦/قسم القفقاس للجمعیة الجغرافیة للملکیة الروسیة) دەڵێت:- دانیشتووانی کەرکوك

١٥٠٠٠کەسن، ٤٠ خێزانیان ئەرمەنی ومەسیحین ئەوانی تر کوردن.

ج- مینۆرسکی موسڵ وویلاتەکەی ساف کوردن، سنووری خوارووی کوردستان بریتییە لە سنووری سەرووی دەشتایی میزۆپۆتامیای خواروو.. ئەوەیان هاورایە لەگەڵ جوگرافی ناسە سۆڤیەتییەکانی تری وەك: سافراستیان، لازاریف، نیکیتین.. تا دەگاتە مەوسوعەی سۆڤیەتیش.

**٤- کوردستانییەتی ئەو ناوچە بە پێی نەخشە کۆنەکان:**

ا- نەخشەی (ئیبن حۆقل لە سەدەی ١٠)، (ئەلبیرۆنی سەدەی ١٠)، (خوارزمی سەدەی ٨) بنیامین بن حنا(١١٦٠-١١٧٣)، (زابو حسن بن سعید١٢٧٤ز)...زۆری تر سەرووی بەغدایان بە(جزیرە)ناوزەد کردووە، خوارووی بەغدایان بەعێراق تۆمار کردووە، بەشێکیان سەرووی بەغدایان بەکوردستان یان بلاد الاکراد یان وەك (ابن حوقل بە مصایف الاکراد) تۆمارکردووە، هەرچی نەخشەی (نصرالدین الطوسیة) موسڵ و تەواوی ویلایەتی موسڵی خستووەتە سەر ئیقلیمی جزیرەی کورد.

ب- لە هەردوو نەخشەی ئیداری عوسمانی ساڵی ١٨٩٣ و١٨٩٦ کوردستان زۆر بەگەورەیی تۆمارکراوە وهەمووئەوناوچە دابراوانەو موسڵ و خوارووی جبل حەمرینیش دەگرێتەوە.

پ- لە نەخشەی کۆنی(محمدبن حسین الکاشغری٧٠٣ز) لە (بلاد کاشغر) نزیك چین تیایدا(بلاد الاکراد)ی دیاریکردووە پێش ١٣٠٠ساڵ[١٣٥] لەو ناوچەیە.

ت- لە نەخشەی ژ:٥ کتێبی گەریدەی بە ناوبانگی بەریتانی (کی لیسترنگ ١٨٥٤-١٩٣٣) بە روونی هەردوو نەخشەی کوردستان وئیقلیمی عێراقی بە جیا دیاریکردووە، بەڵام لێرە عراق العجمیە عەرەبییەکەی دیاری نەکردووە، کوردستانی بەشی رۆژهەڵاتی (اقلیم الجبال)ی دیاریکردووە، گەیشتووەتە شارەزوورو لەخوارووی قەسر شیرین بەرەو ناوەراستی عێراقی ئێستا دەروا کە لەوسەردەمی لەدوای ئەو سنوورە (اقلیم جزیرە ابن عمر) دێت کە کوردستانە، کەرکوك ناوچە ناکۆکەکان کەوتوونە سەرووی (خوارووی سنووری کوردستان کە لە کرماشان بەرەو حلوان وقەسر شیرین ودەروا).

ج-کوردستان لە نەخشەی ئیساك تیریۆنی هۆڵەندی: ئەو نەخشەیە لە ساڵی ١٧٩٠ز گیراوە، ناوی عوسمانی بە تورکمانیان بردووە، لەو نەخشەیەدا کوردستان لەگەڵ عێراقی عەرەبی بەجیا هاتووە، کەرکوك کەوتووەتە ناوەراستی کوردستان

چ - هەردوو نەخشەی ئیداری عوسمانی (بەشی ئاسیای ساڵی١٨٩٣و١٨٩٦).

خ- محەمەد ئەمین زکی بەگ لە (خولاصە..)نەخشەیەکی کوردستانی بە پاڵپشت بە تێکرای نەخشەکانی رابووردوو (چوار سەدەی رابووردووی لۆنگرینگ) ئینجا نەخشەی (مارك سایکس) و نەخشەی (عصبة الأمم)، کۆکراوەی زۆر سەرچاوەی ترە تیایدا کوردستان بریتییە لەدەریای سپی بۆئەرمینیا تا پشت بەسرە لە دیوی ئێران، لە خوارووش لە رۆژهەڵاتی فورات و موسڵ دەگرێتەوە بەسەرووی بەغدا تێدەپەرێ.

**٥- کوردستانییەتی ئەو ناوچەیە بەپێی مەعجەم و ئینسکلۆپیدییەکان:**

ا- بەپێی: ابن خلکان (١٢١١-١٢٨٢)م، وفیات الأعیان ج٣ص٢٤٠، هەروەها (العراق فی التاریخ ص٥٤٨-٥٤٩)، موزەفەرەدین کۆکبری ص١٣٢-١٣٤.. کەرکوك سەر بە ویلایەتی شارەزوور بلاد جبل بووە.

ب- ئیبن خەلدون و چەندین سەرچاوەی مێژوویی ئیسلامی باس لە (جبل الأکراد)[١٣٦] دەکەن لە رۆژهەڵاتی بەسرە ئەو شوێنەی کە ئیبن بەتوتە لە کتێبی (تحفة النضار فی غرائب الامصار-ص٢٠٨) دەڵێ لە بەسرە رەت بووم هەموو رەشماڵی کوردان بوو، لە دائیرەی معارف فەرەنسی دەڵێ جەزیرە و موسڵ[١٣٧] و کەرکوك و هەولێر و سلێمانی و رانییە و کفری یەك یەکە(وحدة إداریة) پێکدەهێنن، هەریەکە لە گەریدە بە ناوبانگەکانی وەك: رۆلف لە سەدەی ١٦ و جاکسۆن لە سەردانەکەی ساڵی ١٧٩٧ و ملینگتۆن لە سەدەی ١٩ هەمان زانیاری و زیاتریش لەوە موسڵیش بە کوردستان وەسف دەکەن.

پ- جوگرافی ناسی گەورەی عوسمانی شمس الدین سامی لە (قاموس الاعلام) لە بارەی کەرکوك دەڵێت کەوتووەتە ولایەی موسڵی کوردستان، مەڵبەندی ئیالەتی شارەزوور بوو، دانیشتووانیان ٣٠٠٠٠کەسن، ٣٦ مزگەوت و١٥تەکییە وخانقا، و١٢ خان و١٢٨٢ دوکانو٨ حمام.

لەشوێنێکی تر بە جۆرێکی تر کوردستانییەتی موسڵی گوزارش کردووەو نکۆڵی لە بوونی عەرەبیش نەکردووە لە (ماددەی ویلایەتی موسل) دەڵێ: خەڵکەکەی زۆری عەرەبن، بەڵام هەرێمەکە پارچەیەکە لە کوردستان.

ت- ئیبن حۆقل لەسەدەی١٠ لە موسڵ بووە دەڵێت: موسڵ ئاوو هەوایەکی خۆش و بازارێکی گەرمی هەیە و زۆربەشیان کوردن.

ج- لە دائرە المعارف الإسلامیە[١٣٨] دەڵێت کەرکوك مەڵبەندی شارەزوورەو پێکهاتووە لە ناوەندی کەرکوك و هەولێر و سلێمانی لە ساڵی ١٨٧٩ گواسترایەوە بۆ موسڵ.

چ- لەل٢١٨(راپۆرتی ویلایەتی موسڵ)دەڵێ دەڵێ شەریف پاشای کورد لە ساڵی ١٩١٩داوای تەواوی ویلایەتی موسڵی کردووەتەوە بەپاڵپشت بەهەردوو (دائرەی معارف بەریتانی و فەرەنسی).

ح-لە ئینسیکلۆبیدیای بەریتانی ساڵی ١٩١١دەڵێت: شاری کەرکوك کەوتووەتە نێو تەپۆڵکەکانی زنجیرە چیاکانی کوردستان سەر بە ویلایەتی موسڵە، قەڵاکەی ١٣٠پێ بەرزە و جوولەکەی تیایە.

خ- لە (موسوعة العالمیة العربیة) لە (مادده: جبل حەمرین) دەڵێ (جبل حەمرین) سنوورێکی سروشتی نێوان کوردو عەرەبە.

د- الموسوعةالحرة البریطانیة - (المادة: حەمرین): (یعتبر حمرین الفاصل الطبیعي التي یفصل المناطق العربیة عن

المناطق الكردية في العراق اي يمكن اعتباره الحد الفاصل بين العرب والاكراد في العراق).

هەروەها لە ماددەی (کردستان الکبری) لە بەشی عێراق بەو شێوەی دەقەکەی خۆی کەرکوك بە کوردستانی تۆمار کردووە: العـراق _ يتركز الأكراد في الألوية الشمالية والشمالية الشرقية: محافظة السليمانية ومحافظة اربيل ومحافظة كركوك ومحافظة دهوك ومناطق (سنجار وزمار والشيخان وعقرة والحمدانية وتل كيف والجانب الأيسر من مدينة الموصل) من محافظة الموصل. وكذلك في منطقتي (خانقين ومندلي) من محافظة ديالى (ديالە).

ر- (جيهان نماه)ی حاجي خليفه جلبي ١٧٣٢م باس لە سنووری کوردستان دەکا دەڵێ کوردستان لە هەرمزد[١٣٩] و مەلاتییە را دەست پێدەکا تا دەگاتە موسڵ و عێراقی عەجەمی.

ز- سیاحتنامە ی ئەولیا چەلەبی: نۆ ویلایەتی عوسمانی کوردن وکوردستان پێکدەهێنن: ئەرزەرۆم، وان، هەکاری، دیاربەکر، جزیره (جزیره بوتان)، ئامێدی، موسڵ، شەهرەزوور، ئەردەڵان.

٦- لە سەرچاوە عەرەبییەکانی هاوچەرخ:

لەگەڵ ئەوەی لەدوای سەرهەڵدانی دەوڵەتی مۆدێرن و بێبەش کردنی کورد لێی ناوی کوردستان لەسەر نەخشە فەرمییەکان سرایەوە[١٤٠]، سەرەرای ئەوەش لە زۆر سەرچاوەی عەرەبی باس لەو راستییە دەکات، هەندێکیان هەڵدەبژێرین:

ا-سەرچاوەی گەورەی میسر بەناوی (الجغرافية السياسية) [١٤١] دەڵێ کوردەکان لە کۆنەوە وڵاتیان هەبووە پایتەختەکەی ئەرابخا (کەرکوکی ئێستا) بووە.

ب- هەریەکە لەسەرچاوەی مێژوویی هاوچەرخ کە بەدەستی عەرەب نووسرابێ زۆرە ئەو راستییە دەدرکێنی، بەڵام زیاتر ئەوانەی مەیلی ئاینیان زاڵە بەسەر عروبی، بۆیە هەوڵدەدەین لەوانی تر هەڵبژێرین، یەکەمیان: قاموس السياسي-احمد عطية الله - لە بابەتی کوردستان ص٩٦٨ شارەکانی کوردستان ریزکردووە کەرکوك سێیەمە .

ث- الموسوعة العربية العالمية: لە بارەی کەرکوك:. .تُعدّ كركوك رابعة كبرى مدن العراق، حيث بلغ عدد سكانها ٩٠٠، ٠٠٠ نسمة في عام ١٩٩٣م، تُعدّ كركوك عاصمة المجموعات الكردية في شمال العراق.

ت- عباس عزاوی لە کتێبی (تأريخ الكاكائيه) لە مێژووی هاتنی ئیسلام بۆ ئەو ناوچەیە کە ناوی کەرکوك دەهێنێ بە (کەرخینی) دەڵێ سەر بە (بلاد کردستان).

ج- مەحمود شاکر لە (تاريخ الإسلامي ج١١ص٨٧) دەڵێت تەقەلای کورد بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی لەشارەکانیان (موسڵ، ئەربیل، سلێمانی، کەرکوك، دیالە).

ح- عەبدولرەحمان بەزاز سەرۆك وەزیرانی عێراق لە کتێبێکی (العراق من الإحتلال الى الإستقلال ص٢١٨) باس لە یاسایەك دەکا بەناوی (قانون اللغات عام١٩٣١) لە ماددەکانی(٢ و٦) باس لە زمانی کوردی فەرمی بۆ خوێندن لە شارەکانی کەرکوك و هەولێر و سلێمانی، لە ماددەی(٨)یش وەك ماددەی (١٤٠)ی ئێستا ماوەی ساڵێکی بۆ دانرا تا راپرسی بکەن لە شارۆچکەکانی موسڵ ئاخۆ کام زاراوەی کوردی و کام زمانیان دەوێ.

٧- کوردستانییەتی ئەو ناوچەیە لە بەڵگەنامەکانی بەریتانی:

ا-دائرة معتمد السامي البريطاني-البلاد مابين النهرين-٨٧٣٥ بغداد ١٩٢١/٦/١.. لەو راپۆرتە باس لە دیاریکردنی سنووری ئەو دەوڵەتەی بەناوی (عراق العربي) دەکا کە بەریتانیا بەنیازە دروستی بکا، دەڵێ شارەکانی کەرکوك و کەلار و کفری عەرەب نین، بەڵام ١٠٠٪ کوردیش نین.

ب- نامەی مس بیل (سەبارەت بە هەڵنەبژاردنی مەلیك فەیسەڵ لە کوردستان) زۆر بە روونی کوردستانییەتی ئەو ناوچەیە دەردەکەوێ، مس بیل (لە نامەی رۆژی ١٩٢١/٨/١٤ بۆ بەریتانیا-العراق في الرسائل مس بيل) هۆی ئەو پرسەی روون کردووەتەوە دەڵێ:- زۆربەی ناو کەرکوك تورکمانن و گوندەکانی دەوروبەریش هەمووی کوردن، هەردوولا داوای دەوڵەتێکی کوردیان کرد لەژێر چاودێری ئێمە، تەنها دووگەرەك لەناو کەرکوك داوای گەرانەوەی عوسمانییان کرد[١٤٢]. ئاماژە بە هیچ عەرەب ناکا.

پ- الوثائق السرية-بغداد ١٩٢٩/٤/٢٣ من همفريز مندوب السامي البريطاني... لەو بەڵگەنامەیە باسی بارودۆخی کوردستان دەکا ودەڵێ بەشی زۆری دانیشتووانی کەرکوك کوردن، باس لەو ناوچەیەی ئێستا ناوی نراوە (مناطق متنازع عليها) دەکا داوا دەکا زمانی فەرمی ئەو ناوچەیە کوردی بێت چونکە کوردن، لە کۆتایی بەڵگەنامەکە خشتەیەکی دانیشتووانی کەرکوکی داوە: ٤٩٪ کوردن، دەرەوەی موسڵ ٧٠٪ی کوردن، کورد لە کەرکوك ٦٧٧٠٢ کەس، تورکمان:٢٨٧٤١، عەرەب:٢٦٥٦١، جوولەکەی:٨٤٧٢، مەسیحی:١٢٢٨کەس.

٨- کوردستانییەتی ئەو ناوچەیە لە راپۆرتی ویلایەتی موسڵ

(تقرير لجنة عصبة الأمم الخاصة بحل النزاع التركي البريطاني حولة ولاية الموصل):

ا-لە ص٢٢٣هاتووە: سنووری کورد و عەرەب لە بەیەك گەیشتنی زاب و دیجلە بەرەو کفری دەروا، بەو شێوەیە و موسڵ لە عەرەب جیا دەبێتەوە، هەر لە ل٢١٩ دەڵێ عێراق هیچ مافێکی لەو ناوچەیە (ویلایەتی موسڵ) نییە و ناوی عێراقیان هەر نەبیستووە، لەل١٥٣ دەڵێ نێوان موسڵ و بەغدا هیچ ناوێکی دیاریکراوی نەبووە، لەل٢١٨ راستەوخۆ تردەڵێ ویلایەتی موسڵ کوردیە، هەرلەو راپۆرتە لە ل١٥٩ باس لەوە دەکا کە لە سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی (١٥٣٤) و دواتریش بەغدا و موسڵ و کەرکوك بە ولایەتی شارەزوور ناوزەد دەکرا.

ب- پاساوی تورکیا ئەوەبوو کە سنووری نێوان کوردو عەرەب هێڵێکی سروشتی و جوگرافی روون هەیە کە ویلایەتی موسڵیش لە عێراق جیا دەکاتەوە ئەویش بریتییە لە هێڵی:رووباری دیالە-جبل حەمرین-جبل مكحول(فوهول)-وادي ثرثار-جبل سنجار[١٤٣].

پ- بەریتانیا لە بەڵگەکانی دژ بە تورکیا دژ بەکوردیش بووە، بەڵام بۆ ئێستا بووەتە بەڵگە لەوانە لە (پرسی ناوی عێراق) دەڵێت شارەزوور هەر یەکە لە کەرکوك و ڕانییە و هەولێر و رواندوزو کۆیە و کفری دەگرێتەوە[١٤٤].

ت- لە لاپەرە ٦٨ تەواوی ویلایەتی موسڵی خستووەتە سەر ئیقلیمی جەزیرەی کورد، بە پشتیوانی نەخشەی نصرالدین الطوسي(١٢٦١ز)، لەونەخشەدا موسڵ وهەولێریشی خستووەتە سەر ئیقلیمی جزیرە.

ج- ڕوونترین ئاماژەی ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ لە بارەی کێشەی کەرکوك دەڵێت دووزخورماتووش کوردستانە، واتە زۆر لە خوارووی کەرکوکیش، ئاماژەبە کفری دەکا دەڵێ سەر بە عێراقە..، بەڵام ئەوە بەڵگەی بەریتانییە[١٤٥].

چ- بەریتانیا گەڕاوە چاکترین نەخشە بدۆزێتەوە لە قازانجی عێراق کەچی لەباروودۆخی ئێستای کوردستان بەکەڵکە، ئەتلەسێکی ئینگلیزی بەناوی (اطلس تایمز) دانەری (بارسۆلۆمیەر) لە ١٩٢٠ دانراوە سنووری خوارووی کوردستان ئاوا دەکێشێ:- لە جەزیرەی ئیبن عومەرەوە بەدرێژای ڕووباری دیجلە ڕۆژئاوای دهۆك بۆئەلقۆش- تلکیف-ئالتون کۆپری-ڕۆژئاوای کەرکوك-تاوغ-بەرەو خواروو[١٤٦]، ئینجا ئاشلی ئەو بەری ئەو سنوورە عێراقە بەڵکو دەڵێ میزۆپۆتامیایە.

ح -لە گەرمەی کێشەکە (فەتحی بەگی نوێنەری تورکیا)بە هاوارەوە ڕوو لە ئینگلیز دەکا و دەڵێ ئەگەر ڕاستی بڵێین ویلایەتی موسڵ ناوچەیەکی کوردییە[١٤٧].

**٩- کوردستانییەتی ئەو ناوچە لە ئامارەکان**

یەکەم: ئاماری پێش تەعریب[١٤٨]: کێشەی ئاماری پێش تەعریب دوانە، یەکەمیان لەو سەردەمی واتە پێش ساڵی ١٩٢١ ئامار لەسەر بنچینەی نەتەوەیی نەبووە، زیاتر ئاینی و تایفی بووە، بۆیە لە سەردەمی عوسمانی لە(دائیرەی ڕەگەزنامە) لە ناسنامە ناوی نەتەوە تۆمارنەدەکرا، تەنانەت لەدوای ئینقلابی ئیتحادولتەرەقی ساڵی ١٩٠٨ی تورکخوازی تەنها ئەوە زیادکرا بە هێما بەرامبەر ئەفسەری کورد پیتی (ك)تۆمار دەکرا، بۆ عەرەب(ع)، دووەمیان خەڵکی کورد لە ئامارەکان ئافرەتانیان نەدەنووسی و گەنجانیشیان نە دەنووسی لەبەر سەربازی، بۆیە ئاماری پێش تەعریبمان کەمەو تەواو دروست نییە، بەڵام دیسان بەڵگەنامەی بەهێزە:

ا- ئاماری بەڵگەنامەکان: الوثائق السرية-بغداد ١٩٢٩/٤/٢٣ من همفريز مندوب السامي البرطاني... لە کۆتایی بەڵگەنامەکە ئامارێکی لە شێوەی خشتەیەکی دانیشتووانی کەرکوکی داوە:٤٩,٥٪ کوردن، کورد لە کەرکوك ٦٧٧٠٢ کەس، تورکمان:٢٨٧٤١، عەرەب:٢٦٥٦١، جوولەکەی:٨٤٧٢، مسیحی:١٢٢٨کەس. لە ئامارێکی (عصبة الأمم) تێکرای کوردی لە کەرکوك بە ٦٣٪ قەبلاندووە.

ب- ئاماری گەڕیدەکان: (ئۆلیڤەر-١٨٩٠) دەڵێت موسڵ ٢٥٠٠٠عەرەب و١٧٠٠٠ کورد و١١٠٠٠تورکمان و٨٠٠٠مسیحی و١٠٠٠جوولەکەی.

پ- ئامارێك لەلایەن (دائـــرة لـــواء کـرکـوك)پـاش جەنگی جیهانی یەکەم کـراوە محـەمـەد ئـەمین زەکی بـەگ لـە یـاداشـتـەکـەی بـۆ مـەلیـك فـەیـسـەڵ لـە ٢٠ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٠ ناردووە بەو شێوەیە: کورد٥١٪، تورکمان٢١،٥٪عەرەب٢٠٪مەسیحی٧، ٥٪

ت- ئامارێکی حکومەتی سوێد کە بە(عصبة الأمم) دراوە لە بارەی دانیشتووانی کەرکوك سەرجەم(١٢٢٢٠٠٠) بەو شێوەیەی[١٤٩] خوارەوە: عەرەب ١٠٠٠٠ کەس، تورکمان٣٥٠٠٠کەس، کورد ٧٥٠٠٠ کەس، کلدان٦٠٠کەس، جوولەکە١٤٠٠کەس.

ج- ئاماری لێژنەی ویلایەتی موسڵ، زۆر جۆرە ئاماری بەریتانی و تورکی و مێژوویی دراوە، ئەوەیان نزیکە لە ڕای لێژنەکە:٤٧٪کورد، ٣٥٪عەرەب، ٢٦٪تورکمان[١٥٠].

دووەم ئامار پاش تەعریب:

ا-ئاماری ساڵی ١٩٥٧ لە کەرکوك ڕێژەی کورد٣ر٤٨٪، ٢ر٢٨٪عەرەب، ٥ر٢١٪تورکمان، مۆرکی تەعریبی بە ئاشکرا پێوە دیارە، زیاتر لەوەش بابروانینە ئاماری ساڵی ١٩٧٧: کورد ٣ر٣٧٪، تورکمان١٣ر١٦٪، عەرەب بەرزبووەتەوە بۆ ١٤ر٤٤٪.

ب- خوێنکارانی ساڵی ١٩٦٠: لە بەڵگەنامەیەکی پەروەردەی کەرکوك تقرير صادر عن (لجنة تثبيت المدارس الكوردية في لواء كركوك) کە بە فەرمانی ژ: ٣٦٣١ لە ١٩٦٠/٣/١٤ (مديرية معارف لواء كركوك) دەرچووە بەوشێوەیە: الكورد: ١٣٦٣٣ التركمان: ١٢٤٠٤ العرب: ٦٥٧١

پ- الوثائق السرية بريطانية-بغداد ١٩٢٩/٤/٢٣. ...، لە کۆتایی بەڵگەنامەکە ئامارێکی دانیشتووانی کەرکوکی داوە: ٤٩٪ کوردن، دەرەوەی موسڵ٧٠٪ی کوردن، کورد لە کەرکوك ٦٧٧٠٢ کەس، تورکمان:٢٨٧٤١، عەرەب:٢٦٥٦١، جوولەکەی:٨٤٧٢، مسیحی:١٢٢٨کەس[١٥١].

**١٠- کوردستانییەتی ئەو ناوچەیە لە ڕێکەوتنە نێودەوڵەتییەکان:**

ا-کوردستانییەتی ئەو ناوچەیە لە ڕێکەوتنی بەدلیسی سوڵتان: ئەو ڕێکەوتنە لە ١٥١٤ لەنێوان (٢٣) میرنیشینی کوردی و سوڵتان سەلیم بە سەرپەرشتی شێخ ئیدریسی بەدلیسی ئەنجام درا، ڕێکەوتنەکە چڕکرایەوە لە (٥) ماددە[١٥٢]، گرنگی ئەو ڕێکەوتنە بۆ ئەو بابەتەی ئێمە لەوە دێ کە شێخ ئیدریس هاتووە گەڕاوە بەناو میرنشین و دەسەڵاتدار و سنووری کوردستانی پێ دیاری دەکرێ، ئەرشاك سافرستیان دەڵێ لە میانی گەڕانیدا هاتووەتە کەرکوك ودیالەو ئەو ناوچەیەو خوارووشی[١٥٣]، واتە دەسەڵاتی کوردی لەو کاتی لەو ناوچەیە بە ئاسایی هەبووە، عەباس عەزاوی لە (العراق بين الإحتلالين) هەمان زانیاری دەدا.

لەدوای ئەو ڕێکەوتنامەیە (ذوالفقاربن علي) بەگی کورد بەغدای داگیر کرد لە ساڵی(١٥٢٧)[١٥٤]پێش عوسمانی، دوایی لە٣١ی کانوونی یەکەمی ساڵی١٥٣٤لە بەغدا کوژرا، بەڵام لەگەڵ داگیرکردنەوەی بەغدا لەلایەن عوسمانییەکان دیسان دەسەڵاتی کورد(ئەردەڵان) گەڕایەوە تا نزیك بەغدا، کەرکوك بوو بە مەڵبەندیان لە شارەزوور، لەسەر ئەو بنچینەیە

(گرایمەر)و (تۆما بوا)[155] لە (دائرەی معارف ئیسلامی) دەڵێن: ناوچەی کەرکوك هەر لەژێر دەسەڵاتی گەورە کوردەکان بووە.
ب- لە ڕێکەوتنی ئەرزەڕۆم کە لە٢٨ی تەمووزی ساڵی١٨٢٣بەسترا، پێکهاتووە لە (٧) بەش- لە بەشی یەکەم باس لە کوردستان دەکات و دەڵێ سنووری دەگاتە نزیك بەغدا[156].

پ- سنووری خوارووی کوردستان لە ماددەی ٦٢ی سیڤەر، سنوورەکە دیاریکراوە و بریتییە لە ڕۆژهەڵاتی فورات، وا دیاریکراوە: (بریتییە لە ڕۆژهەڵاتی فورات، و باشووری ڕۆژئاوای سنووری ئەرمینیا کە لەدوای ئەوەش دیاری دەکرێ، لە سەرووی سنووری تورکیا و سووریا و میزۆپۆتامیا کە لە پەرەگراف (٢)ی ماددەی (٢٧) دەستنیشانکراوە).
ئەو سنوورە هەر لە خۆڕا نەبوو، ئەو کاتی زۆربەی پرۆژەکانی باسی سنووری کوردی دەکرد باسی لە فورات کردووە، لە پرۆژەکەی (مسترڤانیستارت)بۆ کیرزۆن ئینجا ئەویش بۆ ئەنجومەنی وەزیران لە مانگی نیسانی ساڵی١٩٢٠، لەکۆنگرەی سان ڕیمۆش سنوورەکە هەر فورات بووە، لە کۆنەوە ئەو ناوچەیە بەلای کەم تا فورات کورد بوونە یاقوت حەمەوی (١١٧٨)م لە (ج١معجم البلدان -باب في صفة الجبال...) تەواو ئەوبەری فورات بە (برية العرب) وەسف دەکا، بۆیە لە کێشەی سنووری عێراق لەگەڵ سعودیە داوای ئەو ناوچەیەی دەکرد تا فورات، دوای بە فشاری (برسی کۆکس)سعودیە وازی لەو داوایە هێنا و لە ٥ی ئایاری ساڵی ١٩٢٢ لە موحەمەرە ڕێکەوتن.
ت-کوردستانییەتی لە کۆنگرەی قاهیرەی ١٩٢١/٣/٢٤: ئەو کۆنگرەیە بۆ دروستبوونی دەوڵەتی عێراقی بوو، مێجەر نۆئیل سنووری کوردستانی بۆ کۆنگرەکە ڕاڤە کردو سنووری خوارووی بە (جبل حەمرین) تۆمارکرد. لە کۆتایی کۆنگرەکە هەر پاڵپشت بەو سنوورەی ماددەی (٦٢) ی سیڤەر کرا، چەرچڵ خوارووی کوردستانی هێشتەوە بە هەڵپەسێردراوی نەیخستە سەر عێراق وەك (برسی کۆکس و مس بیل و ویلسۆن) دەیانویست.
ج- لە سایکس بیکۆش سنووری عێراق بەلای ئەو ناوچانە نەهات.

**١١- کوردستانییەتی ئەو ناوچە بە پێی یاسایی:**
هەموو ئەو بەڵگەنامە مێژوویی و جوگرافی و زانستی و سیاسییانە زەمینەی یاسای کوردستانی بوونی ئەو ناوچانە دەگەیەنن، سەرەڕای ئەوەش هەندێ ڕەهەندێ یاسایی تر هەیە:
ا- بەڵگەنامەیەکی یاسایی بنچینەیی بۆ ئەو توێژینەوە ئەوەیە کە لە کۆتایی دەرەنجام و بڕیارەکانی لیژنەی نێوبژیوانی کێشەی ویلایەتی موسڵ هاتووە (ليس للعراق حق شرعي او حق الغلب على تلك الأراضي) بە کوردییەکەی دەڵێ هیچ مافێکی لەو ناوچەیە نییە.
ب- وەك دەزانین وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەپێی ڕێکەوتنی سیڤەر دروست بوونە، کەرکوك لەسەر میلاکی عێراق لە عوسمانلی جیانەبووەتەوە، واتە بەپێی ماددەی٩٤ی ئەو ڕێکەوتنە جیانەبووە، بەڵکو کەرکوك لەسەر میلاکی کوردستان جیاکراوە بەپێی ماددەی ٦٢بوو.
پ- لە کۆتایی جەنگ ساڵی ١٩١٨ دیسان (عەلی ئیحسان پاشا-نوێنەری سوڵتان) بە بروسکەی ڕۆژی ٣٠ی تشرینی یەکەم ساڵی ١٩١٨ حکومەتی شێخ مەحمودی بەرەسمی بە میراتگری عوسمانی لە ناوچەکە ناساند، کەواتە ئەو ناوچەیە بە شەرعی میراتی شێخ مەحمودە مادام دەسەڵاتێکی شەرعی وەك عوسمانی ئەو ناوچەی بە فەرمی پێداوە و بە کەسی تری نەداوە، نەلە سەر ئاستی کەسێتی نە لەسەر ئاستی ئیقلیمی و نێودەوڵەتی.
١٢-کوردستانییەتی کەرکوك لە١٠ بەڵێننامەکەی ١٩٣٢: بۆ ئەوەی عێراق لە عوسبە وەرگیرێ ١٠ بەڵێننامە لە عێراق وەرگیرا، لە بەڵێننامەی ژ:٩ لقی١ دان بەوە دەنێ کە کەرکوك زۆرایەتی کوردە.
**١٣- کوردستانییەتی ئەو ناوچەیە لە شیعر و ئەدەبیاتدا:**
شیعری قانیع:
بەڵی سنووری بەبێ زیادو کەم
بۆت بەیان دەکەم بەبێ دەردوخەم
بەپێی نووسینی جوگرافیاکان
تەرەفی غەربی بۆت ئەکەم بەیان
لە کێوی تۆروس تا ئەسکەندەروون
هەتا بەحری ڕەش بەبێ چەندو چوون
تەرەفی شمال هەر لەبەحری ڕەش
هەتا ئەردەهان بەبێ غەل و غەش
لە ئاردەهان بۆ ئاوی ئاراس
ئەمە شیماڵە بە عیلمی قیاس
تەرەفی شەرقی لە کێوی ئەلوەند
تا گۆلی وورمێ بەبێ چوون وچەند
لەکێوی ئەلوەند تا جەبەل حەمرین
ئەهواز و شەنگار پارچەی نەسیبین
ئەمە جنووبە چاکی بزانە
ناو ئەو سنوورە خاکی کوردستانە

لە شیعرێکی تری حاجی قادری کۆیی ئەو سنوورە وا هاتووە:
کوردە دەزانی لە کوێ ساکینە خزمانی تۆ
گوێ بگرە تا بۆت بڵێم مەسکەنی قەومانی تۆ
کێوی تۆرووس و عومقی حەوزەیی ئەسکەندەروون
غەربییە تا بەحری ڕەش سەرحەدی بە مەیدانی تۆ
بەحری ڕەش واردهان ئاوی ئاراز لێ بزانن
حەددی شیماڵە کۆچەری بێ جەولانی تۆ
ئەلوەند و گۆلی وەرمێ تا سەری ئاوی ئاراز
سەرحەددی ڕۆژهەڵاتی جۆگە و مەیدانی تۆ
ئەهواز و کێوی حەمرین و ژەنگار و نەسیبەین
بۆ جنووبە ڕەوزەیی ڕیزوانی تۆ
داخلی ئەم حدوودە ١٢ ویلایەت هەیە
دەڵێن ١٢ ملیۆنە نفووسی کوردانی تۆ

**١٤- کوردستانییەتی ئەو ناوچەیە لە زاری عێراق خۆی**

ا-بەڵگەی هەرە کۆتایی ئەوەیە خودی مەلیك فەیسەڵ (مەلیکی عێراق) لە کۆنگرەی سیڤەری ساڵی ١٩٢٠ ئامادە بوو، وەفدی کورد لەوێ نەبوو، مەلیك مۆری کرد کە سنووری کوردستان لە ڕۆژهەڵاتی فوراتەو لە ماددەی ٦٢ تۆمار کرا، کە هەموو ئەوناوچە جێ ناکۆك و بە سەدان کیلۆمەتر زیاتر دەگرێتەوە[١٥٧].

ب- لە هەڵبژاردنی مەلیك فەیسەڵەوە:- زۆر بە روونی سنووری کوردستان لەو ڕاپرسییە دەردەکەوێ، لە کوردستان دەنگیان پێنەدا، لە سلێمانی هەوڵدرا ئەو بەشداری نەکردنەی خەڵکی بەوە بشارنەوە کە هەرکەسی خانوەکەی لە ٢٠٠٠ڕوپیە کەمتر بێت نابێ بەشداری ڕاپرسی بکا، لە هەموو سلێمانی مەلیك فەیسەڵ و دەنگ بە عێراق ٣٢ دەنگ بوو، لە کەرکوکیش تەنها ٦٤دەنگی هەبوو١٩٧دەنگی تر بە مەرجی ماف کورد وەك لە مەرجەکانی ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ هاتبوو، تورکمانیش لەوێ هەڵوێستیان باش بوو دەنگیان بە مەلیك فەیسەڵ وعێراق نەدا، هەیە وادەزانی لەبەر تورکیا بوو... لەڕاستیدا ئەوە لەگەڵ ڕاپرسییەکەی ویلایەتی موسڵ جیا بوو، پەیوەندی بە تورکیا نەبوو ئینجا تورکمانی کوردستان لەگەڵ عوسمانی تەبا نەبوون.

پ- برسی کۆکسی (حاکمی بەریتانیا لە عێراق) بەنووسراوی فەرمی ژ: ٣٣٣٠/٤ی ١٩٢١/٢/٢٢ دەنێرێ بۆ حکومەتی تازەی عێراقی و فەرمانیان پێدەکا کوردستانی خواروو بخەنە سەر عێراق، ئەو بڕیارە تادوای چارەسەری کێشەی ویلایەتی موسڵ ئینجا جێبەجی کرا، کەرکوکیش وەك باقی شارەکانی کوردستان تا ساڵی ١٩٢٥ ئالای عێراقی لێ هەڵنەدرا.

ت- مس بێڵ ناوبانگی هەیە وەك کۆکس دژ بە کوردە، لەنامەی ٢٩/ئایار/١٩٢١ و نامەی ١٩٢١/٦/٥بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی باس لە سەفەرەکەی بۆ سلێمانی و کەرکوك دەکا کە لە کتێبەکەی (العراق في الرسائل المس بيل ص٢٩٢-٢٩٣) بڵاوکراوەتەوە، دوو ئاماژەی یاسایی و سیاسی روونی تیایە: یەکەمیان دەڵێ (ان اهاليها اكراد كلهم) ئەو ناوچانە هەمووی کوردن. دووەمیان لەو کاتی ئەو سەفەرەی لە بەغداوە بۆ کەرکوك و سلێمانی بە سەفەر بۆ (خارج-واتە خارجی عێراق) وەسف کردووە.

ج- لە٨ی شوباتی ساڵی ١٩٢٩ شەش پەرلەمانتاری کورد یاداشتێکیان پێشکەشی پەرلەمانی ئەوسای عێراق کرد داوای زیادکردنی بودجەیان بۆ ناوچە کوردییەکان کردووە، تیایدا ناوی شارەکانی کوردی تاوتوێ کراوە لەنێوان هەردوولا: کە بریتی بووە لە: سلێمانی و کەرکوك و هەولێر و بەشێکی موسڵیش.لەسەر ئەو بنچینەیە لە ساڵی ١٩٤٣ نوری سەعید و مەلا مستەفا ڕێکەوتن کە: ویلایەتێکی ئۆتۆنۆمی پێك بێت بۆ کورد لە کەرکوك و سلێمانی و هەولێر و هەندێ شارۆچکەی موسڵ تیایدا[١٥٨].

**١٥-کوردستانییەتی ئەو ناوچە لە سکاڵانامەکان:**

ا- نامەی شێخ عەبدولقادر شەمزینی لە ٢٥ی حوزەیرانی ساڵی١٩٢٠بۆ کۆمیسیری بەرزی فەرەنسا تیایدا سنووری کوردستانی ئاماژە پێکردووە بەروونی کەرکوك و موسڵ دەگرێتەوە -ئەو بەڵگەنامەیە لە١٧/جولای/١٩٢٠ لە ئەرشیڤی فەرەنسا هەڵگیراوە.

ب-نامەی سەرکردایەتی(کۆمەڵەی ئیجتماعی کورد-مەمدوح سالم، ئەمین عالی بەدرخان..) لە ١٧ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٠بۆ کۆنگرەی ئاشتی نارەزان بەرامبەر ئەو سنوورەی لەماددەی ٦٢ی سیڤەر هاتووەو ڕۆژهەڵاتی فوراتی بەسنوور داناوە کە موسڵ و هەموو ئەو ناوچانەی ئێستا پێی دەوترێ ناکۆکان دەگرتەوە، کەچی لەو سکاڵایە بەوە نارازین دەڵێن لە دیوی ڕۆژئاوای فورات و خواروو تریش کوردستانە.

پ- لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی عێراقە (لە سەرەتای سەدەی بیستەم)نامەی سوورەییا بەدرخان بۆ سەرۆکی کۆنفرانسی ئاشتی سنووری خوارووی کوردستانی لەسەر هێڵی ٣٤ دیاریکردووە[١٥٩]. لە نامەیەکی تری لە ئەرشیڤی فەرەنسا(E ٢١٢٧) لە ١٤ی ئاداری ساڵی١٩٢٠ هەمان ئاماژەی تیایە. نامەیەکی تریشی لە ئەرشیڤی بەریتانی (FO ٦٠٨/٩٥) لە٧ی کانونی یەکەم ساڵی١٩١٨بۆ کۆمیسیری بەرزی بەریتانیا لە میسر

ت-نامەی ئەمین عالی بەدرخان بۆ سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای کۆنفرانسی ئاشتی لە ١٨ی ئاداری ساڵی١٩٢٠ -NO ٢٧٥m/٥٥٩ تیایدا باسی ویلایەتەکانی (بەتلیس و وان و موسڵ و دیاربەکری) وەك کوردستانی باس کردووە.

ج- نامەی تۆفیق وەهبی لە ٢٣ی مارسی ساڵی١٩٣١بۆ کۆمیسیۆنی ئینتداب دەڵێ لە کەرکوك تەنها چەند خێڵێکی عەرەبی لێیە ئەوی تری کوردن.

هەموو ئەو یاداشت و نامانەی سەروو لە دانیشتنی (٢٠)ی لیژنەی ئینتدابی باڵا لە دانیشتنەکانی ژ:٤٢٢-١٩٣١/١٦٥ هەروەها BB٢٢٠، هەروەهاCB١١٩٨ تاوتوێ کراو بەرز کرایەوە بۆ (عصبة الأمم) بەپێی بەڵگەنامەی عوسبە CBM١١٤٠ و١١٥١ لە ٢٤ی ئابی ساڵی١٩٣٠[١٦٠].

**١٦- کوردستانی ئەو ناوچەیە لە کاتی داگیرکردنی عێراق:**

ا- بروسکەی چەرچل بۆ مەلیك فیصل:((اننا وعدناك بتأسيس دولة عربية وليست امبراطورية، لذلك ان حدودك لن تتجاوز جبل حمرين الى ما ورائه فهو كوردستان))[١٦١]..

ب- لە یادەوەرییەکانی ڕۆژی ١٤ی ئاداری ساڵی ١٩١٥ لەلایەن سیر ئەرسەر هیرتزل دەڵێ کاتی سوپای بەریتانی سەرکەوتنی بەدەستهێناو لە ساڵی ١٩١٧ بەغدای گرت بەرەو سەروو چوو، بەبروسکە ئاگادارمان کردنەوە کە لە(جبال حەمرین) نەپەڕنەوە با تووشی ڕووبەڕووبوونەوە نەبن لەگەڵ کورد[١٦٢].

پ- پرۆژەی نۆئیل بۆ دروستکردنی کۆنفیدراڵییەکی کوردستان بۆ سێ بەش یەکەمیان کوردستانی خواروو مەڵبەندەکەی لە سلێمانی بێت، موسڵ و دیاربەکریش هەریەکە مەڵبەندی کوردستانی ڕۆژئاوا و سەروو بێت[١٦٣].

**١٧- کوردستانییەتی ئەو ناوچەیە لەرووی سایکۆلۆجییەوە:**
تا ئەو ساتەو لە کاتە هەرە سەخت و شلۆقەکان نە حکومەتی عێراقی نە بەعس نە شۆڤێنییەکانی ئێستا لەرووی سایکۆلۆجییەوە بوێری ناکەن بڵێن ئەو ناوچەیە عەرەبییە، یان کوردستانی نییە، بەڵکو دەڵێن عێراقییە، ئەوەش چەمکێکی فراوانە هەولێر و سلێمانیش دەگرێتەوە، لە مێژوودا یەك بەڵگە نییە کێشە لەنێوان کوردو عەرەب هەبووبێت لەسەر ئەو ناوچەیە یان لە بەڵگەیەك هەبووبێت داوای ئەو ناوچەیان کردبێت یان حوکمیان لێ کردبێت.

**چارەسەری**

ئەو کێشەیە ئەوەندە سادە نییەو هەر زادەی سیاسەتی بەعس نەبووە، بەڵکو قووڵ دەبێتەوە بۆ کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراست و پرسی میراتی ئیستیعماری، ئەو هۆکارانەی پرسی تەواوی کوردستانی گەورەی ئاڵۆزکردووە هەمان هۆکار و هۆکاری سەرباری تریش هەیە، هۆکارە سەربارەکان بریتین لەوەی لەگەڵ هاتنی بەریتانیا و بگرە کەمێك پێش هاتنیشی کار لەسەر قرتاندنی ئەو ناوچەیە کراوە لە کوردستان، ئینجا حکومەتە یەك لەدوای یەکەکان کاریان لەسەر ئەو سیاسەتە کردووە، ئەو کێشەیە لە ئاستی ئیقلیمی و جیهانییە، بۆیە دەبینین تورکیا و وڵاتانی عەرەبی لەسەر هێڵن بۆ ئەو کێشەیە، کەواتە نەخشە و پلانێکی زۆر وردی دەوێ، جێی داخە ئەوە نەکراوە رەنگە دەسەڵاتی کوردی لە توانایدا نەبێ راستەوخۆ و راشکاوانە داوای ماڤی خۆی بکاتەوەو بڵێت کەرکوك کوردستانییەو ناوچە دابراوەکان کوردین و دەمانەوێ بگەرێتەوە کوردستان، وەك بینیمان بەرەیەکی عروبی بەهێز لەجیهان و بەرەیەکی تۆرانی هاوشێوەی و تەنانەت کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیش ئەوەندە هاوسۆزی ئەو خواستە نین، بۆیە دەبێ رێگاو سیاسەتی بە دانایی و زانایانە و دووربین و هەمەلایەن و قووڵ بین بگرییە بەر، ئیش لەسەر ستراتیژی و سەرچاوەکان بکەین، بۆ ئەو مەبەستەش بەکورتی ئەو هەنگاوانەی پێویستە:

١- پێش هەموو هەنگاوێك پێویست بەوە دەکا کە دانیشتووانی ئەو ناوچەیە بە هەموو پێکهاتەکان لایەنگری ئەو مافە بن و بەختیاری چارەنووسیان لە گەرانەوەی ئەو ناوچەیە بۆ سەر کوردستان ببینەوە، ئەوەش کۆمەڵێك هەنگاو و دەستپێشخەری تری دەوێ، لەوانە: دروستکردنی نموونەی جوان لە ئەزموونی کوردستان لە رووەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و یاسایی و فەرهەنگی، وا بکرێت دادگەری و دیموکراسی هەبێ تیایدا جێی هەموو لایەك ببێتەوە، لەو رووەوە کەموکوری گەورە هەیە، دەسەڵاتی کوردی نەیتوانیوە سەرنجی دانیشتووانی ئەو ناوچەیە رابکێشی، بۆیە برایانی تورکمان و ئاشووری و لای تریش بەلای کەمی نەبوونە یارمەتیدەر، رەنگە پاساوی دەسەڵاتی کوردی ئەوە بێت بەشێك لە سیاسییەکانی تورکمان بە ئەجندای بیانی دژ بە ماڤی کوردن، ئەوەیان راستە بۆ بەشێك، بەڵام ناکرێ سیاسەتی چەوتی خۆشمان بەرامبەر ئەوانە دەرنەخەین، هەندێکی بە نموونە باس دەکەین کە لە

**چوارچێوەی بابەتەکەیە:**

أ/ تا ئەو ساتە دەسەڵاتی کوردی بەشدارییەکی راستەقینەی کەمایەتییەکانی پێ نەکردووە لە ئەزموونی کوردستان، دەبوایە جێگری سەرۆکی هەرێم و بەشێکی گرنگ لە حکومەتی هەرێم بدرابوایە بەوان، وەك پێویست نەبووە.

ب/ گەلێ جار دەبینین ململانێیەکی توند لەنێوان کورد و تورکمان لە بارەی ژمارەی تورکمان و خواستەکانیان روودەدا، بەزیانی هەردوولا تەواو بووە، ئەوەی لەسەر کورد پێویست بوو دەبوایە پشتیوانی هەر خواستێکی رەوایان بکا، تەنانەت ئەگەر ئۆتۆنۆمی و فیدرالیشیان داواکرد، خۆ ئەو مافە لای کورد نییەو کوردیش لێی نەخواردووە تا کورد بە نەرێنی وەڵامی بداتەوە، . ئەو مافە لای بەغدایە، خۆ ماف ئەگەر لەلای کوردیش بێت پێویستە بە جوانی بیداتەوە، ئینجا برایانی تورکمان هەرێمێکیان نییە تا داوای فیدراڵی و ئۆتۆنۆمی بکەن، کەواتە کێشەکە لە خودی تورکمان و لای بەغدایە ئیتر کورد بۆخۆی دەکاتە لایەن، دەبوایە پشتیگری بکا بۆ هەموو ئەو خواستانەی لە بەغدا داوای دەکەن، بە پێچەوانە ئێستا بووەتە کار و کاردانەوەیەکی وا بەغدا و عروبییەکان و ئەوانەی غەدریان لە هەردوولا کردووە بە ئاسوودەیی تەماشاکەرن.

٢- ئەو هەموو زەبر و زەنگ و ئەنفال و کیمیایی بەسەر کورددا هاتووە تا دەگاتە پلەی جینۆسایدەکە بە بریاری سەرۆکایەتی عێراق ژمارە ٢٦ی رۆژی ١٠ی ئەیلوولی ساڵی ٢٠٠٨ ناسێندراو پەرلەمانیش گەواهی دا هەموو ئەوانە بەکاربهێندرێت کە لەو ناوچانە ئەنجامدراون.

٣- هەنگاوی دووەم: ئەو کێشەیە شێوازێکی گرنگی وەرگرتووە کە ناوی نراوە (المناطق المتنازعة علیها)، ئەوە ئاستێکی ئەرێنی وەرگرتووە، بەڵام نەرێنیشی هەیە هەڵسێت (دل و قودسی کوردستان) بدەیتە راپرسی، ئینجا ساغکردنەوەی کەرکوك و ناوچە دابراوەکان لەنێوان کوردستانی بوون و عێراقی بوون ئەوا لەسەر ئاستی زۆرایەتی ناوەخۆی عێراق و ناوچەکەو جیهان زیاتر عێراقیانەیان قەبوڵە لە کوردستانی بوونی، بۆیە دەبێ شێوازی گەڵاڵەکردنی بگۆرێ، چاکترین فۆرمی ئەوەیە ئەو کێشەیە بخەیتە نێوان کوردستان و هەرێمێك لە عێراق، ئەویش هەرێمی عەرەبستانە، ئەو کاتی هەموو عێراقییەکان نابنە لایەك دژ بە کوردستان، رەنگە پێچەوانەش بێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو هەنگاوەش بێتەدی پێویست بەوە دەکا هەرێمی عەرەبی لە ناوچەکە دروست بێت، ئەوەش لە پرۆژەی عێراقی (٣) فیدراڵی دێتەدی، جێی داخە لە گەرمەی ئەو پرۆژەیە کورد ئەوەندە گرنگی (٣) فیدراڵی نەزانی و بگرە پێشی پەست بوو، بۆیە داواکردنی عێراقێکی (٣) فیدراڵی خواروو و ناوەراست و سەروو دەروازەی چارەسەری ئەو کێشە ئاڵۆزەیە، ئەو کاتی لە توانای کورد دەبێ ئەو ناوچانە بگێرێتەوە، ئینجا پاساوی یاسایی و مێژوویی و نێودەوڵەتی کورد زۆر بەهێزتر دەبێ.

٤- بە پاڵپشتی خاڵی(٢) واپێویست بوو کوردستانییەتی ئەو ناوچە نەخرابوایە ماددەی ١٤٠و راپرسی، بەڵکو

راپرسییەکە لەسەر ئیدارەکەی بکرا بوایە ئاخۆ خەڵکی ناوچەکە دەیانەوێ بگەڕێنەوە سەر حکومەتی هەرێم یان حکومەتی بەغدا، ئەوەی ئێستا لە ماددەی ١٤٠ راپرسییەکە لەسەر خاکەکەیە بۆیەش ناوی (مناطق متنازع عليها)یە دەبوایە ناوی (إدارە المتنازع عليها) بوایە.

٥- گوتاری کورد ڕوو لە برایانی عەرەب خەلەلی گەورەی هەیە هەروەك گوتاری ئەوانیش ڕوو لە کورد چەوتە، لەو ناوە دوژمنانی هەردوولا و مەبەستەکانی سایکس پیکۆو (پلانی پەرتەوازەیی میللەتی ئیسلام) سەرکەوتوو دەبێت، ئەگەر برایانی عەرەب بیانەوێ عێراق بە یەکگرتووی بمێنێتەوە ئەوا چۆن بە تەعریب و توانەوەی میللەتی کورد دێتە دی، دەبێ ئەوان هەوڵی پێکەوەنووسانی(إندماج) هەردوو نەتەوە بکەن نەك تواندنەوەی(انصهار)، لە حکومەتە یەك لەدوای یەکەکان تا ئێستاش هەوڵی دووەم هەیە بەدەستووریش کراوە، لە ماددەی(١)ی دەستووری ساڵی ١٩٦٨[١٦٤].

هەرچی گوتاری هەڵەی کوردیشە ئەوەیە نابێ لە خۆڕا مێژووی برایەتی کوردو عەرەب بشێوێنی گوایە ئەوان هەر کوردستانیان داگیر کردووە لە فەتحی یەکەمەوە تا ئێستا !، ئیتر ڕۆژئاواو ئیسرائیلیش بێ تاوان پێشان بدەی لەو گۆبەندەی لەرۆژهەڵاتی ناوەراست بەرپایان کردووە، تیایدا هەموولایەك بەکوردو عەرەبەوەیان مەغدوور کردووە، کەواتە ئەو کێشانەش بۆ ئەوەی بەرپاکراوە بۆ ئەوەی برایەتی کوردو عەرەب نەگەرێتەوە، چارەسەرکردنی دادپەروەرانە زیان نییە بە هیچ لایەك.

٥- لە خۆڕا نەیەڵی عێراق لە بەندی (٧) دەرچێت پێش چارەسەرکردنی ئەو کێشانە.

٦-ئەو زانیارییانەی لەو نووسینەو چەندین کتێبی تر هاتووە بەکاری بهێنی لە بوارەکانی سیاسی و یاسایی و لەسەر هەردوو ئاستی سەروو و خواروی کوردو عەرەب و تورکمان و ئیقلیمی و جیهانی تێبگەیەنرێن لە ڕەوایی ئەو کێشەیە.

*** سەرچاوە و پەراوێزەکان:-**

١- لە ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٤ یاسای ئۆتۆنۆمی جاردرا بۆ ئەو ناوچانەی زۆرایەتییەکەی کوردن و بەپێی ماددەی(١)ی ئەو یاسایە (منطقة الکردستان) بووە کیانێکی یاسایی، لە برگەی (ج)ی ماددەی(١) شەخسیەتی مەعنەویشی پێدەدا.
٢- بڕوانە: الکرد في الوثائق العثمانیة - د عثمان علي ص١١٤، ص١١٥ ص١١٨، ص١٢٠، ص١٢١ لە یەکێ لەو بەڵگەنامانەی بە مۆری والی کوردستان کراوە بەناوی (احمد عزت).
٣- بڕوانە: د علی وردی -لمحات من تأریخ العراق ق١ج٥ص٥٨
٤- موسوعة العراق السیاسیة ص٩٣
٥- بڕوانە: عبدالرزاق الحسني -تأریخ الوزارات ج١ ص١٠٠.
٦-خاڵی (١٤)ی ڕێکەوتنامەی ١١ی ئادار.
٧- کێشەی(ئبیبە) زۆر وێچووی کێشەی کەرکوکە، ئەویش دانیشتووانی هەردوولای تێدایە و نەوتاوییە و لەنێوان هەرێمێکی فیدرالی و ناوەندە، بەڵام لەوێ تەعریب نەبووە.
٨- سنوورێك بەناوی بڕۆکسل بە ئاشکرا گوزارش لەوە دەکات کە ئەو سنوورە هیچ بنچینەیەکی جوگرافی و ڕەگەزی و ئاینی و مێژوویی نییە، بۆیە ئەو ناوەیان لێنا کە لە شاری بڕۆکسل دوا مۆری پێوە نرا، وەك سنووری (کیرزۆن)ی نێوان ڕوسیا و پۆڵەندا.
٩- بۆیەش بەکر سدقی کورد بیری لە ئینقلاب کرد و پەیرەوی کرد لە ساڵی ١٩٣٦.
بڕوانە:-
- یاداشتەکانی مەندوبی ئەڵمانیا لە عێراق فریتز غروبا لە (العراق في المذکرات الدبلوماسین الأجانب).
١٠- بڕوانە: نەخشەی سایکس پیکۆ
١١- ئەو میساقە لە٢٨ی کانوونی دووەمی ساڵی١٩٢٠ دەرچووە پێکهاتووە لە ٥ ماددە.
١٢- السیاسة البریطانیة العظمی..ص١٠٠
١٣- ایران تأریخ والحضارة ص٥٣
١٤- بۆ ئەو مەبەستە توێژینەوەی بە پێزی (وێنەی کورد لە زانینی مێژووی ئیسلامیدا) بخوێنەوە.
١٥- تقریر المفتش العام الأول - ٣٧١ .FO/١٢٢٥٥ . .، والصنف الثاني هم الأتراك الذین حسب المصادر والوثائق التأریخیة المتوفرة فقدوا هویتهم القومیة وتکردوا..
١٦- تأریخ ابن خلدون ج٢ص١٠
١٧- لە (بدایة ونهایة ج١٦) باس لە بڕیارێکی جینۆساید دەکا لە سەردەمی ئەمەوی:. . (وفیها استعمل الحجاج علی فارس محمد بن القاسم الثقفي، وامره بقتل الاکراد).
١٨- هەرچەندە دەقی ئاشکرا دژ بە(فەزڵ)هەیە لەسەر بنچینەی ڕەگەزورەنگ و چینایەتی، کەچی لە سەردەمی ئەمەوی باوی وەرگرت و زانای گەورەش تێوە گلان، ئەوەی عەرەب نەبوایە پێیان دەوت موالي، زۆر کتێب و سەرچاوەی گرنگی تر بە ڕوونی دەری دەخا کە (زۆربەی) ئەهلی سوننە و جەماعە پێیان وایە عەرەب فەزڵی بەسەر عەجەم هەیە، لە کتێبی(مسبوك الذهب في فضل العرب- بە فەرموودە یاساغی هاوسەری نێوان عەرەب و عەجەم دەکا)لەمەزهەبی ئیمامی شافعیش لە بابی زەواج بەشی(کفاءة) هەمان ڕای هەیە، چەندین مەزهەبی تریش ئەو دەردەیان هەیە، شیخ الإسلام ابن تیمیة - لە (اقتضاء الصراط المستقیم (ج١ص٤١٩ دەڵێ: (فإن الذي علیه اهل السنة والجماعة: اعتقاد أن جنس العرب افضل من جنس العجم، عبرانیهم وسریانیهم، رومیهم وفرسیهم وغیرهم) تا ئەو ڕادەیە لە کتێبی (العروبة بین الشعوبیة والاستعمار) هاتووە خودی ئیسلام پێویستی بە ئەخلاقی عەرەب بووە !!، بۆ زیاتر لە: (المعرفه والتأریخ - ابو یُوسُف یعقوب بن سُفیان الفسوی، المحقق: د اکرم ضیاء العُمَري ج٢ ص٦٣)هاتووە.. تزوج بن سیرین عربیة وکره الموالي لما یدخلهم من السبي. قال: فذهب بن عون یتشبه به فلم یحمل له العرب ذلك، فرفعوه إلی بلال بن ابي بردة بن ابي موسی الأشعري فضربه وفرق بینهما، قال له: طلقها. قال: هي طالق. قال: ثلاثا قال: واحدة تبتها. قال: اقول له ثلاثا وهو یبتها. وقال له: طلقها. قال: هي طالق ثلاثا. قال: واحدة. قال: اقول له ثلاثا وهو یفتیني بطلاقها). دەشلێن عەرەب عاقل ترن و کوردو عەجەم دەبێ لە خزمەتیان بن، زۆر لە بنەماڵە کوردەکان بەو هۆیەوە خۆیان بردووەتەوە سەر ڕەچەڵەکی عەرەب، بەو شێوە زۆربەی میللەتانی لاواز لە شام وسەرووی ئەفریقا لەنێو عەرەب توانەوە، لەو بەڵگەنامە بەریتانییە دەردەکەوێ کە کورد نەتوانەوە:
- ١٦١ /٧٣٠ CO/٢....ینطق الکرد باللغة الکردیة التي تعود الی اللغات الآریبة ولا تربطها شيء بالعربیة ذات الاصل السامي. بینما استطاع العرب ان یفرضوا لغتهم علی الشعوب الغیر العربیة في سووریا ومصر ومناطق اخری فلم یستطیعوا ذلك في کردستان حیث لا زال الکرد یتکلم بلغته الاصلیة...
١٩- تقریر ولایە موصل ص١٠٩ لە کتێبی(مشکله موصل-. ص ٩٥) کوردی کردووەتە ١٧٠٠٠ وتورکمانی کردووەتە ١١٠٠٠. (بۆ ئاگاداری: ئەو ڕاپۆرتەی ویلایەتی موسڵ کە لەبەردەست ئێمەیە کەمێك لەگەڵ ئەسلییەکە لە لاپەڕەکان جیایە دەقەکەی ئەوەیە_ولایة الموصل-تقریر لجنة عصبة الأمم الخاصة بحل النزاع الترکي البریطاني حول ولایة الموصل-مراجعة والتحقیق:عبدالرزاق مەحموود القیسي)
٢٠- فلسطین في الرسائل عبدالناصر وکندي ص٢٢
٢١- ئەو بڕیارە لە ساڵی ١٩٦٩ دەرچوو بوو، بەڵام ئەو کاتی باری جێبەجێکردنی ئامادە نەبوو.
٢٢- ئەو هەنگاوە وێچووی بڕیاری (هیتلەر)بوو، کاتی لە گەرمەی بەرگری میللەتانی ژێر دەستە لە ساڵی ١٩٤٣ (ڕاینهارت هیدریچ)ی سەرۆکی (جستاپۆ-هەواڵگری) دەستووری ڕەهای پێدا بۆ پاکتاوی ڕەگەزی هەرێمی(باڤاریا) و لێدانی شۆڕشگێڕان، ناوی بە (جەلاد)ڕۆیشت.
٢٣- مەبەستمان لە عروبی ئەوانەی زیاد لە پێویست ناشیۆنالیزمن بەرامبەر میللەتانی برایان، ئەو هەستەیان بەرامبەر دوژمنە ڕاستەقینەکانیان نییە، ئینجا دان بەوە نانێن کە تەعریب ڕوویداوە. بۆ جیاکردنەوە لە میللەتی عەرەب ئەو

زاراوەمان بەكارهێناوە.
٢٤- دەقی بڕیارەكەی (عصبة الأمم) لە ل٤٥٧ی (المشكلة الكردية في الشرق الأوسط) بخوێنەوە. مەبەست لە بڕیاری ڕۆژی ١٦ی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٢٥ەو بڕیارەیە كە ولایەتی موسڵ خرایە سەر عێراق بەپێی لیژنەكەی عوسبە.
٢٥- بڕوانە:دەقی دەستووری عێراق ساڵی ١٩٢٥ پێكهاتبوو لە (١٠باب) و(١٢٣)ماددە.
٢٦- بڕوانە:الاسلام والعلمانية.. ص٢١٠
٢٧- بڕوانە مس بيل -العراق في الرسائل مس بيل ص٣٤٦.
٢٨- فورستر-نشأة العراق الحديث ص٧٢ لە(تاريخ الإسلامي) و(الملل والنحل والأعراق) بە هەمان شێوە ئەو سنوورەی (تۆماس)یان دیاریكردووە لەو ڕێكەوتنەكە.
٢٩- لە بنەچەدا ئەو ڕایە بۆ مێجەرسۆن بەهەڵەی دروست بوولە ساڵی ١٩٠٨ وایزانی (تورك+مان) واتە پیاوی تورك.
٣٠- لەدائیرەی ڕەگەزنامەی عوسمانی ناوی نەتەوە نەدەنووسرا، بەڵكو ناوی ئاین و شوێن دەنووسرا، یەكەم جارلە سەردەمی دەسەڵاتی ئیتحادوئەلتەرەقی بەرامبەر هەر ئەفسەرێكی غەیرە تورك هێمایەكیان بەرامبەر دادەنرا، (ع) بۆ عەرەب، (ك)بۆ كورد..
٣١- بۆ زیاتر بڕوانە..دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة -ص٤٨٤
٣٢- لە ڕاپۆرتی ویلایەتی موسڵ بە ڕوونی ئەوە باس دەكات.
٣٣- بۆ زیاتر بڕوانە توێژینەوەیەكی بە ڕێزی صنعان احمد اغا- موسوعه التركمان العراقی - اصاله التركمان
٣٤- لەو بارەیەوە بڕوانە (احداث ووقائع كركوك من١٧٠٠ الى ١٩٥٨)
٣٥- ولاية الموصل. ١٣٢.
٣٦- تقرير ولاية الموصل ص ١٢٧، ص١٢٩، ص١٣٢- بزووتنەوەی (عموم الترك) نەبووە، ڕەنگە مەبەستی ئیتحادوئەلتەرەقی بێت.
٣٧- بۆیە كەمتر تورك لە پایەی دەوڵەتی عوسمانی بوو زیاتر سەربازو فەرمانبەری سادە بووە، لەوەوە بزووتنەوەی تۆرانی و كەمالی سەریهەڵداو ووتیان تورك لە هاوكێشەی عوسمانی زۆر مەغدورە لە بەرامبەر كورد و چەركەس و ئەرنائوت و عەرەب...، پاساوی بنچینەیی مستەفا ئەتاتورك لە گوتارەكانی ڕۆژی ١، ٢، ٣\٣\١٩٢٤سەبارەت بە هەڵوەشانەوەی خەلافەتی عوسمانی لە ئەنجومەنی باڵای توركی - پەرلەمان- ئەوەبوو.
٣٨- فۆن هامری دەڵێت موسڵ كوردن و بە كوردی قسە دەكەن، بەڵام توركی و عەرەبیش دەزانن وقسەی پێدەكەن.
٣٩- محەمەد ئەمین زەكی بەگ بە ووردی ئەو پرسەی ڕوون كردووەتەوە.
٤٠- لە ڕاپۆرتی (همفریز-مەندوبی بەریتانی ئەو تێبینییەی نەك لە كەركوك لە سلێمانیش كردبوو لە ڕاپۆرتی ڕۆژی ١٩٣١/٤/٢٣ دەڵێ:٩٩٪ی سلێمانی كوردن كەچی ٧٠٪ی فەرمانبەرانی غەیرە كوردن.
٤١- العراق في الرسائل مس بيل ص٣٣٥
٤٢- ولايه الموصل ص٥٠.
٤٣- احمد خانقا- كردي ٢. احمد احمدي افندي- كردي ٣. جميل بك بابان- كردي٤. عمر آغا- كردي ٥. الشيخ حميد طالباني- كردي ٦. رضا بك- كردي ٧. مجيد افندي- تركماني ٨. حسين بك نفطجي- تركماني ٩. الحجي جميل بك- تركماني ١٠. حسقيل افندي- يهودي ١١. قسطنطين افندي- كلداني ١٢. حسين علي ممثل الصحراء- عربي
٤٤- بڕوانە: سياحتنامە- اوليا چەلەبی، شەرەفنامە - شەرەفخانی بەدلیسی، معجم البلدان -یاقوت حەمەوی، الصحاح - الرازي، ....
هەروەها بڕوانە:-
- نشأة الدولة العراقية - ج١ ص ١٣.
٤٥- ئەوە نامەی ئەسكەندەرە:... انّه شاهد بإيرانشهر رجالا ذوي أصالة في الراي، وجمال في الوجوه، لهم مع ذلك صرامة وشجاعة. . ئەوەش نامە وەڵامی ئەرستۆیە بۆ ئەسكەندەر:. .. فهمت كتابك في رجال فارس. فأما قتلهم فهو من الفساد في الأرض ولو قتلتهم لأنبت البلد امثالهم لأنّ إقليم بابل يولّد أمثال هؤلاء الرجال، من أهل العقول والسداد في الراي، والاعتدال في التركيب... (ابن مسكوية -تجارب الأمم ج١).
٤٦- بڕوانە (ج١ معجم البلدان) لە ڕاڤەی إيران شهر:. .كانت ارض العراق تسمى دل إيران شهر أي قلب بلدان مملكة الفرس.
٤٧- معجم ما استعجم: العراق هو مابين هيت الى السند و الصين الى الري خراسان الى الدليم والجبال واصبهان..
٤٨- بڕوانە: الصحاح الرازي، (معجم البلدان)ی یاقوت حەمەوی، لسان العربي فيروز ئابادي، هەروەها شەرەفنامەو سیاحەتنامەو..كۆدەنگی هەیە لەو بارەیەوە. هەروەها لە ڕاپۆرتی (ولايه الموصل ص٧٢-٧٣) هەر ئاوای بۆچووە.
٤٩- بڕوانە: تقريرلجنة عصبة الأمم الخاصة بحل النزاع التركي البريطاني حولة ولاية الموصل ص٢١٩
٥٠- تقرير ولاية الموصل.. ص٦٦
٥١- بڕوانە: العراق في خوارط القديمة- جمع وحققها - الدكتور احمد سوسة، مطبوعات المجمع العلمي العراقي ١٩٥٩- مطبعة معارف - بغداد ؛ ؛خريطة رقم (٩).
٥٢- هەمان سەرچاوە خريطة رقم (٦)
٥٣- ه س - خارطة رقم٣.
٥٤- فورستر... نشأة الدولة العراقية ج١ ص١٣.
٥٥- ياقوت حةمةوي- معجم بلدان ج٢-ص٢٧٢
٥٦- سياسة البريطانيا العظمى تجاه مستقبل كردستان ص٢٠١
٥٧- لە زۆربەی كتێبە كۆنەكان و لە خودی نەخشەی ئیبن حوقل عێراق و بەسرە بە جیا ناویان هاتووە ئەوە(تاريخ جرجاني)یە یەكێ لەو نمونانەیە...أبو عمرو أحمد بن عمر بن أحمد المطرز البكرآباذي كان قد كتب الكثير وانفق مالا عظيما في الحديث وسافر إلى سجستان وبست وهراة ونيسابور واصبهان والعراق والبصرة وبغداد واليمن. ..مات ٤٠١ - تاريخ جرجان﴿ ١٠١ ﴾
٥٨- هەر یەكە لە ابن قدامە وابن خردادو مقدسی و وكی

لیسترنگ لە ص١٠٧-١٠٨ لێی وەرگرتوون.
٥٩- كتێبەكانی:(معجم البلدان) و (قاموس الأعلام)و (سیاحتنامە) و(شرفنامە) كە لە سەدەی (١٦) دەرچووە: (اشار الي بلاد الفارس، وجاء فيه انها تشمل: عراق العجم، اذربيجان، ارمينيا، عراق العرب).
٦٠- ولاية الموصل . .ص٦٩
٦١- العراق في آثار الفتن. .. المصدر السابق ج١ص٢٥٩
٦٢- كوتلوف -ثورة العشرين. .ص٢٥
٦٣- خارطة رقم: ١٩ لأبن الحوقل-(العراق في الخوارط القديمة).
٦٤- هس -خارطة رقم: ٣١ لقزويني.
٦٥- خارطة رقم: ١٢البلخي.
٦٦- ولاية الموصل..ص٦٨
٦٧- بڕوانە: خارطة رقم:١٣ -العراق في الخوارط القديمة.
* (حەدیسە)یەكی تر لەو سەردەمی لەسەر ئەو نەخشەیەو هەندێ نەخشەی تر لە شوێنی ئێستای گوێر دەبینرێ، هەرچی ئەو حدیسەیەی لەسەروو هاتووە ئەو حەدیسەیەی ئێستایە كە كەوتووەتە ڕۆژئاوای بەغدا.
٦٨- بڕوانە نەخشەی ئیبن حوقل لە ساڵی ٩٧٧ز هەروەها نەخشەی عوسمانی ١٨٩٣ و نەخشەی ١٨٩٦.
٦٩- ابن خلكان - وفيات الأعيان ج٣ص٢٤٠، هەروەها العراق في التأريخ ص٥٤٨-٥٤٩، موزەفەرەدین كوكبری ص١٣٢-١٣٤
٧٠- القزويني- آثار البلاد واخبار العباد٣٦٨
٧١- الإسلام والعلمانية وأثرهما في نشأة الدولة العراقية. .ص٢١٨
٧٢- ( الموسوعة العربية العالمية. . مادة: علوم عند العرب والمسلمين)لە ل١٣٠ی ئەو كتێبە ناوی ئیقلیمەكان و وڵاتانی تێدایە.
٧٣- ينظر: احوال العراق في المشروطية. . المصدرالسابق، ملحق رقم (١)ص٢٩٢، وملحق رقم (٣) ص ٣٠٣-٣٠٢.
٧٤- ابن خلكان - وفيات الأعيان ج٣ص٢٤٠، هەروەها العراق في التأريخ ص٥٤٨-٥٤٩، مزەفەرالدین كوكبری ص١٣٢-١٣٤
٧٥- القزويني- آثار البلاد واخبار العباد٣٦٨
٧٦- بڕوانە: چارەنووسی فیدرالی دوای دەرچوونی عێراق لە بەندی ٧.
٧٧- Briton Cooper Bush Britain India and Arabs P.40; and Marian Kent Oil and Empire P.120.
٧٨- ينظر: ا-العراق في التأريخ. .. المصدر السابق ص٦٦٧ ب-موسوعة العراق السياس... ص٤١١
٧٩- معجم البلدان- ج٥ ص٢٢٤
٨٠- إذ ورد عليه رسول الأردوان (ئۆردوانی پێنجەم) بكتاب منه فجمع اردشير الناس لذلك وقرا الكتاب بحضرتهم فإذا فيه إنك قد عدوت طورك واجتلبت حتفك ايها الكردي المربي في خيام الأكراد. .. (تأريخ الطبري).
٨١- یاقوت حەمەوی-معجم البلدان ج٥ ص٢٢٤
٨٢- كي ليسترنك-بلدان خلافة الشرقية ص١١٦
٨٣- لەو بارەیەوە توێژینەوەیەكی ووردی سلێمان ابوكاشخ بخوێنەوە بەناوی (حقيقة وجودالكردي في الموصل)
٨٤- لە بەشی (استنتاج ولايه الموصل)ص١٥٤
٨٥- لە گەشتەكەی (ئەسفەهانی بۆ شنۆ و ڕەواندوز) لە فارسییەكەی بەئیالەتی كوردستانی ناوبردووە.
٨٦- ولاية الموصل..ص٧٧
٨٧- یاقوت حەمەوی -معجم البلدان ج٥ص٢٢٤
٨٨- ابن خلكان-وفيات الأعيان ج٣ص٢٤٠، هەروەها (العراق في التأريخ ص٥٤٨-٥٤٩)، مظفرالدين كوكبري ص١٣٢-١٣٤.
٨٩- القزويني- اثار البلاد واخبار العباد٣٦٨
٩٠- حنابطاطو- العراق.. العراق. ج١ ص٣٥ (یەك تەغار لە بغداد= ٢٠٠٠ كیلۆ گرام، كەچی لە بەسرە= ١٥٣٨كیلۆ گرام، لە موسڵیش جیابووە، بەڵام دیاری نەكردبوو.)
٩١- ئەو جمعییەیە لە موسڵ دروست بوو بە سەرۆكایەتی (احمد فخری) لەدوای ساڵی ١٩٢٠ز.
٩٢- سياسة البريطانيا العظمى تجاه كردستان د. سعد بشير اسكندر ص٢٠١
٩٣- فورستر- ج٢ ص ٤٨٢
٩٤- بڕوانە (معجم البلدان) مادة: موصل
٩٥- تأريخ الوزارات العراقية ج١ ص٢٨١ - ئەوكات كرینی هەرێم و ویلایات باوبووە.
٩٦- وفيات الأعيان ص١٩٣
٩٧- حوادث ووقائع كركوك منذ ١٧٠٠م حتى ١٩٥٨م
٩٨- بەپێی هەندێ سەرچاوە یەكەم جار ناوی كەركووك (بەو ناوە) لە (زەفەرنامە)ی تەیمورلەنگ هاتووە لە سەرەتای سەدەی ٩.
٩٩- هەمان سەرچاوە.
١٠٠- شێخ ڕەزای تاڵەبانی شیعرێكی لەو بارەیەوە هەیە بە توركی:
موصل اولدي ولايت، نافع افندي والي.
ويل لكم الرعية، كول باشوة اهالي.
واتە: هاوار بۆ خەڵكی ئەو ناوچە موسڵ بووە ویلایەت ونافعە فەندیش والی بێت.
واپێدەچی ئەو شیعرە كارو كاردانەوەبن دژ بەیەك لەگەڵ شاعیری كەركوكی عەبدوڵڵا ساڤ كە پێخۆشبوونی خۆی دەردەبڕی:
اشبو تأريخ اوقنور كوردم مقام اوجده
هر طرف جوهرلو بر صورت ايله سنطور اوستنه
شهرزوري موصل حدبايه الحاق ايتديلر
باق ايشه كم قويديلر قنبوري قنبور اوستنه
١٠١- لە بەشی (استنتاج ولاية الموصل) ص١٥٤
١٠٢- وەك لە تقرير ولاية الموصل ص٢٦ باس لەو دیمەنەی عەرەب دەكات لە موسڵ.
١٠٣- ولايه الموصل..ص٢٠٢-٢٠٣
١٠٤- بڕوانە: ج١ي معجم البلداني یاقوت حەمەوی هەروەها مقدمة ابن خلدون. .لە بنەچەدا ئەلبیرۆنی یەكەم جوگرافی ناسی ئیسلامییە كە جیهانی دابەشكرد بۆ ٧ئیقلیم،

قەزوینی پلانی توێژینەوەی كتێبەكەی (اثارالبلاد واخبار العباد) لەسەر ئەو ٧ ئیقلیمە دارشتووە.

١٠٥- بڕوانە دابەشی ئیقلیم وبورجەكانی ج١ی معجم البلدان.

١٠٦- بەڵگەنامەی بەریتانی وفەرەنسی ژ:٢٣ لە (كۆمەڵە و ڕێكخراوە كوردییەكان لە بەڵگەنامەی بەریتانی و فەرەنسی)

١٠٧- فورستر - نشأة الدولة العراقية ص١٣

١٠٨- بڕوانە: موسوعة العربية العالمية مادة: العلوم عند العرب والمسلمين

١٠٩- سوریا و میزۆپۆتامیا (عێراق) بەپێی ماددەكانی ٩٤ هەتا ٩٧. ئیسرائیل.. بەپێی ماددەی (٩٥). حیجاز بەپێی ماددەكانی (٩٨-٩٩). بەو شێوەیە میسر لە ماددەی (١٠١). سودان لە ماددەی (١١٣). مەغریب و تونس لە ماددەی (١١٨). لیبیا بە ماددەی (١٢١).

** بێجگە لەفەرهەنگی وڵاتانی تر خودی فەرهەنگی ئیداری وسیاسی عوسمانی كۆن و نوێ، دانیان بەكوردستان نابوو، سنووریشیان دیاریكردبوو.

١١٠- بۆ ئەو مەبەستە بڕوانە:- توێژینەوەیەكی ووردو زۆر بە پێزی (عبدالرقیب یوسف)بە ناوی(حدود كردستان الجنوبية تأريخيا وجغرافيا) لە ص٢٠٤-٢١٠ تیایدا بەلای ئەو جۆرە جیاوازییانەش چووە.

١١١- خارطة رقم:١ (العراق في الخوارط القديمة).

١١٢- خارطة رقم:٨ رقم:٩

١١٣- ولاية الموصل.. ص٦٦

١١٤- بۆ زیاتر توێژینەوەیەكی سليمان الدخيل بەناوی (حقيقة وجود الكردي في الموصل) بخوێنەوە.

١١٥- لە كۆنترین نەخشەی سەر زەوی كە لە دوای سەرگۆن(٢٣٠٠پ ز)كراوە، بەشی (الجبال) لە سەرووی بابل وبلاد اشور دیاریكراوە. ئەو نەخشەیە لە ژ:١ی (العراق في الخوارط القديمة) دانراوە.

١١٦- لەناو بەڵگەنامەكانی عوسمانی بۆ یەكەم جارە د. عوسمان علي كۆمەڵە بەڵگەنامەیەكی دۆزیتەوە لە بارەی زانیاری نوێ سەبارەت بە كوردستان، بەتایبەتی لە بارەی ولایەتی كوردستان، كە وەرچەرخانێكی گرنگە لە مێژووی (ناوی كوردستان) لە ئیدارییەوە بەرەو سیاسی - بڕوانە: الكرد في الوثائق العثمانية.

١١٧- معجم البلدان ج١ص٤٥٦

١١٨- لەلایەن مەلا جمیل ڕۆژبەیانی لە چوارچێوەی چوار دەوڵەتە كوردییە لە بیركراوەكان باسیان دەكا. بە ڕوونی ناسنامەی كوردی پێداوە لەلایەن (شەرەفخان و محەمەد ئەمین زەكی)یەوە ناوی نەهاتووە، لە(مراقد المعارف / الشيخ محمد حرز الدين ج٢ص١٣١).. عمران بن شاهين الخفاجي (سوسنگردي) امير البطيحة (البطيحة:- ارض واسعة بين واسط والبصرة) لە (معجم البلدان /ج ٢ ص ٢٣٨) هاتووە: زعيم قبائل خفاجة في العراق، توفي في المحرم سنة ٣٦٩ هـ بالبطيحة، ابن اسير لە (كامل في التأريخ) بە ڕێگر وەسفیان دەكا، بەڵام ڕاستییەكەی ئەوەیە تەنها لە سەرەتا هەندێ كاری ڕێگری لە ئەهوارەكان كراپێش بوون بە دەوڵەت.

١١٩- الكرد في الوثائق العثمانية-د. عثمان علي ص١٤٣

١٢٠- ٣٢٩-WO / ٢٨٦٩من السفارة البريطانية - بغداد الى الدائرة الشرقية - وزارة الخارجية البريطانية ٥/ شباط/١٩٥٩

... وفي اليوم الثالث من المحاكمة صرح مهداوي تصريحا مثيرا للغاية حول الكرد، قائلا والتي سبق وان اشرنا اليه في الفقرة ٢ من البرقية رقم ١٠٢ بتأريخ ٢٧ كانون الثاني و التي يزعم بان نفوس العراق سيصل عام ١٩٦٠ الى١٠مليون لأن الكورد الذين يسكنون في المنطقة الجبلية كبيرة بدءاً من اسكندرونة و انتهاءا بالمحمرة، يعتبرون حماة الجمهورية العراقية الديموقراطية.. .

١٢١- كوتلوف - ثورة عشرين ص٢٥

١٢٢- فورستر-نشأة الدولة العراقية ص ١١٥.

١٢٣- د.علي الوردي - لمحات. . ج٥ ص١٢٧

١٢٤- حنا بطاطو، العراق (ج١ ص١٨٥)

١٢٥- بڕوانە: چارەنووسی فیدراڵی دوای دەرچوونی عێراق لە بەندی ٧.

١٢٦- لە بارەی كوژرانی(محمد بن الحسين بن علي بن حمدون ابو الحسن اليعقوبي) خەتیبی بەغدادی لە زنجیرە زۆرەكانی (تأريخ البغداد لەج٢ص٢٥٢) هاتووە: قتل بحلوان في شهر ربيع الأول من سن(٤٣٠) قتله ابو الشوك امير الاكراد. واتە ئەو ناوچەش دەسەڵاتی كوردی لێبووە.

* ئەو ڕاپۆرتە لە كتێبی(ولايه الموصل) مراجعه وتحقيق عبدالرزاق القيسي بڵاوكراوەتەوە.

١٢٧- عبدالرزاق الحسني- تأريخ الوزارات العراقية- ج١ ص٢٨٠ .

١٢٨- مقدمه ص٧٤ - هەرچەندە ئەوەندە شارەزای جوگرافی نیم، بەڵام بە ووردی سەرنجم دا نەخشە كۆنەكان و ئەو چەمكە جوگرافیانەی سەردەمی ابن خلدوون، گومان هەیە ئەو شوێنە مەبەستی (جبل حەمرین) بێت چونكە لە نەخشەی ژ:٣ی(كی لیسترنگ-بلدان الخلافه الشرقيه) شوێنی مەراغەی لەنزیك دەریاچەی ورمێ دیاریكردووە ئێستاش هەر لەوێیە، لە نەخشەی ژ:٢ شوێنی جبل حەمرینی بە (بارما) تۆماركردووە، ابن خلدوون و زۆربەی جوگرافی ناسەكانی ئیسلامی لە ئەوپەڕی سنووری كوردستان لە سی شوێن ناوی (جبل الاكراد)دەهێنن یەكێكیان ئەوەیە دووەمیان لەنێوان بەسرەو ئەسفەهان، ئەوی تر لە عەفرین سەرووی ڕۆژئاوای شام نزیك دەریای ناوەڕاست.

* لە ل١٩٩-٢٠٠ی شەرەفنامەو لەلایەن محەمەد ئەمین زەكیش لە(تاریخی سلێمانی) باسیان كراوە.

١٢٩- حمدالله مستوفي (٧٤٠ك)یش بە قەزوینی بەناوبانگە، بەڵام جیایە لەگەڵ خاوەنی كتێبی (اثار البلاد واخبار العباد)ئەویش بە قەزوینی بەناوبانگە ئەوەیان ناوی تەواوی زكريابن محمد القزوينية(٦٠٠-٦٨٢ك)

١٣٠- كی لسترنگ لە كتێبی (بلدان الخلافة الشرقية) دەڵێت بۆ یەكەم جار حمدالله مستوفي(٧٤٠ك) لە كتێبی (نزهت القلوب) باسی كوردستان دەكا.

١٣١- شهاب الدين الأعشي -(مسالك الأبصارفي ممالك

الأمصار ج٤ص٣٧٣-)
١٣٢- ئیبن خەلدوون لە (مقدمه ص٧٤).
١٣٣- گەریدەی بەریتانی جاكسۆن لە ٢٥ /٧/ ١٧٩٧ز سەردانی مۆسڵی كرد و دەڵێت: موسڵ زۆر ئاوەدانە و هەموو ئایینەكانی لێیە، بەڵام زۆربەی كوردن و زمانی سەر شەقام زیاتر كوردییە.
١٣٤- فۆن هامری دەڵێت موسڵ كوردن وبەكوردی قسە دەكەن، بەڵام توركی وعەرەبیش دەزانن و قسەی پێدەكەن.
١٣٥- ئەو نەخشەیە لە بەغدا لە (دیوان اللغات العثمانية) دانرابوو - بڕوانە خوڵاصەیەكی تأریخی كوردو كوردوستان لە پێشەكی راستكردنەوەكانی (محمدزكی بەگ) لەلایەن محمد جمیل رۆژبەیانی.
١٣٦- . .. وفي شرقي بلاد خوزستان جبال الأكراد متصلة إلى نواحي أصبهان وبها مساكنهم ومجالاتهم وراءها في ارض فارس... تأريخ ابن خلدون ص٨١. لە(مقدمة ص٦٣) دووبارەی كردووەتەوە.
١٣٧- ارض الجزيرة: وهي جزيرة ابن عمر، وتشتمل على ديار ربيعة ومضر، وتسمي ديار بكر، وهي ما بين دجلة والفورات وكلها تسمي بالجزيرة، وبها مدن وقرى عامرة. ومن مدنها المشهورة الموصل المصدر: عجائب البلدان- لسراج الدين ابن الوردي
١٣٨- دائرة المعارف الإسلامية (باللغة الفرنسية)، ج٥ ص١٤٧، وقد الف ما يتعلق بـ (كركوك) فيها المستشرق (كرامرز)، ثم اضاف إليها (تومابوا) ملاحظات هامة.
١٣٩- جاران هەندێ سەرچاوە بە كەنداوی عەجەمیان دەوت (هرمز).
١٤٠- تەنها لە ئێران ئوستانێك بەناوی كوردستان هەر ماوە.
١٤١- عدد من الأساتذة المختصين- (الجوغرافيا السياسية ص٤٥٨) ساڵی ١٩٦١ دەرچووە.
١٤٢- العراق في الرسائل مس بيل ص٣٣٥
* ئەو راپۆرتە لە كتێبی (ولايه الموصل) مراجعه وتحقيق عبدالرزاق القيسي بڵاوكراوەتەوە.
١٤٣- تقرير.. ص٥٩
١٤٤- تقرير..ص٦٧
١٤٥- تقرير ولاية الموصل ص٧٢ لە ص٥٥ تا ص٨٠ بریتین لە بەڵگەی بەریتانی كە لە قازانجی عێراقی و عەرەبە كەچی بەكارمان هێناوە.
١٤٦- تقرير ولاية الموصل ص٧٩
١٤٧- ولاية الموصل ص٢١٨
١٤٨- تەعریب لە سەردمی كێشەی ویلایەتی موسڵ (١٩٢٣) دەست پێدەكا، هەرچی بەتورك كردنە لە ساڵی (١٩٠٨)ەوە دەستی پێكردووە.
١٤٩- لە كتێبی (منطقة كركوك ومحاولات تغيير واقعها القومي) وەرگیراوە.
١٥٠- ولايه الموصل...ص١٩٨-١٩٩
١٥١- الوثائق السرية-بغداد ١٩٢٩/٤/٢٣ من همفريز مندوب السامي البرطاني.
١٥٢- لە كانوونی یەكەمی ١٩١٨ سوورەییا بەدرخان ناوەرۆكی ئەو رێكەوتنەی لە نامەكەیدا بەناوی (كۆمیتەی ئیستیقلالی كورد) بۆ بەریتانیا دەرخستووە، كە كورد بە ئارەزووی خۆی ئەو رێكەوتنە چاكەیان لەگەڵ سەلیم مۆر كردووە، ئەو رێكەوتنە (لەگەڵ هەوراز و نشێویش) تا سەرەتای سەدەی (١٩) بەردەوام بوو، لەراپۆرتی بەریتانی- كۆلۆنێل ئیفلینستۆن هاتووە و دەڵێ ئەو رێكەوتنەی كوردو عوسمانی تا ساڵی ١٨٢٦ی خایاند، بووە هۆی دروستبوونی ١١ ئیمارەتی تر.
١٥٣- ئەرشاك ئەفراستیان- (كوردو كوردستان..) ص٣٩-٤٠
١٥٤- لە هەندێ سەرچاوەی تر باسی ئەو داگیركردنە لە ساڵی ١٥٢٧ز دەكەن و لە ١٦٣٣ فارسەكان دەریان كردووە لە ١٦٣٨ جارێكی تر عوسمانی گرتیانەوە.
١٥٥- دائرة المعارف الإسلامية (فرنسي)، ج٥ ص١٤٧.
١٥٦- جوگرافی ناسی گەورەی ئیسلامی ئیبن حۆقل لە سەدەی١٠ لە موسڵ بووە دەڵێت: موسڵ ئاوو هەوایەكی خۆش و بازارەكی گەرمی هەیە و زۆربەشیان كوردن. هەرچی قاموسی عوسمانییە لە قاموس الاعلامی شمس الدين سامی، هەروەها لە لە(ماددەی كوردستان) و (ماددەی ویلایەتی موسڵ) دەڵێ: خەڵكەكەی زۆری عەرەبن، بەڵام هەرێمەكە پارچەیەكە لە كوردستان. بۆ ئەو مەبەستەو زیاتر بڕوانە: ل٣٠٧ی (كوردو كوردستان لە یەكەم ئەنسیكلۆپیدیای عوسمانی).
١٥٧- بڕوانە: دەقەكانی سیڤەر وخوێندنەوەیەكی تر -پ ی سەلام ناوخۆش و مسعودعبدالخالق.
* هەریەكە لە برسی كۆكس ومس بیل و زۆری تر لەسەر زاری عێراق حیساب دەكرێت چونكە ئەو كاتی ئەوان عێراقیان بە رێوە دەبرد، زیاتر لەوە ئەوان عێراقیان دروست كرد.
١٥٨- تأريخ الإسلامي ج١١ص٨٧ وص٨٩
١٥٩- بەڵگەنامەی بەریتانی و فەرەنسی ژ:٢٣لە (كۆمەڵەو رێكخراوە كوردییەكان لە بەڵگەنامەی بەریتانی و فەرەنسی).
١٦٠- ئەو بەڵگەنامەی سەروو لە كتێبی (المشكلة الكردية في الشرق الأوسط ص٤٦٠) وەرگیراوە.
١٦١- الإسلام والعلمانية وأثرهما في النشأة الدولة العراقية ص٢١٨
١٦٢- Briton Cooper Bush Britain India and Arabs P.40; & Marian Kent Oil and Empire P.120.
١٦٣- سياسة البريطانيا العظمي. . ص١٤٢.
١٦٤- الشعب العراقي جزء من الأمة العربية هدفه الوحدة العربية الشاملة وتلتزم الحكومة بالعمل على تحقيقها.

## * ئایندەی کەرکوك نەخشە ڕێگایەك بۆ چارەسەری پرسی پارێزگاکە:

ئینستیتیوتی MERI ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بۆ توێژینەوە

ئاشکرایە کە مێژووی تازەی کەرکوك تووندوتیژیو ناسەقامگیری پێوە زاڵە، و بارودۆخی ناسکی شارەکەش گونجاو بووە بۆ ئاڵۆزکردنی ململانێکان. گرووپە یاخیبووە توندڕەوەکانیش کێشەو گرژی نێوان پێکهاتە ئێتنی(ڕەگەزی یان نەتەوەیی)و ئاینییە جیاوازەکانیان لە کەرکوك قۆستوەتەوە[1].

به بەرزبوونەوەی ئاستی تووندوتیژیی بە ڕادەی سەردەمی شەڕی تایفەگەری کە لە ساڵانی(٢٠٠٦- ٢٠٠٧) تۆمارکرابوو[2]، داهاتووی کەرکوك دووبارە خرایەوە بەر باس. هەر لە کۆنەوە کەرکوك لانەی ژمارەیەکی زۆر لە نەتەوەی وەك کوردو تورکمان وعەرەب‌و ژمارەیەکی تر لە پێکهاتەی دیکە بووە. بەهۆی ئەو دیموگرافییە هەمەچەشنەیەش چەندین بۆچوونی دژ بە یەك هەن سەبارەت بە مێژووی کەرکوك، کە ئەوەش خۆی لە خۆیدا بووەتە بەربەست لە بەردەم دۆزینەوەی چارەسەرێکی سیاسی کشتگیر بۆ پارێزگاکە.

لە ئێستادا، چەقی ململانێی سیاسی لەسەر کەرکوك لەسەر کۆنترۆلکردنی ئیدارەو سنووری جوگرافیای پارێزگاکەیە. تا ئێستا کێشەی کەرکوك بە چارەسەرنەکراوەیی ماوەتەوە سەرەڕای ئەوەی کە دەستووری عێراقی ساڵی(٢٠٠٥) ئاماژەی بە ڕێکارەکانی چارەسەرکردنی پرسی تەواوی ناوچە جێناکۆکەکان لە ڕێی ماددەی(١٤٠)وە کردەوە. ئەو ماددە دەستوورییە، کە دەبوو پێش کانوونی یەکەمی ساڵی(٢٠٠٧) جێبەجێکرابوایە، وەك سەرچاوەیەکی ململانێ لەنێوان بەغداو هەولێر ماوەتەوە. هەرچەندە ماددەی(١٤٠) پرۆسەیەکی سێ قۆناغی بۆ ئاساییکردنەوەو سەرژمێری‌و ریفراندۆم دەستنیشانکردووە، بەلام چەند گرفتێك سەبارەت بە هەندێك پرسی گرنگی وەکو ماف دەنگدان‌و سنووری پارێزگاکەو پرسیاری ریفراندۆم لەو ماددەیەدا بەدی دەکرێت. سستی ویستی سیاسی‌و ماددەیەکی دەستووری ناڕوون، وای کردووە کە پرسی کەرکوك بە چارەسەر نەکراوەیی بمێنێتەوە. سەرباری ئەو گرفتانەش، بۆچوونی زۆرانێك ئەوەیە کە هەر چارەسەرییەك بۆ پرسی کەرکوك کە لە بەرژەوەندی کوردەکان بێت دەبێتە هەنگاونان بەرەو سەربەخۆیی. کەرکوك خاوەن مێژوویەکی درێژی پڕ لە تەنگەژەیە، بۆیە ئاساندن‌و تیشك خستنەسەر هەندێك لەو خاڵە سەرەکییانە لە مێژووی پارێزگاکە گرنگە. بە چاوپێخشانەوەیەکی خێرای مێژووی کەرکوك دەکرێت بیروبۆچوونەکانی ئێستای پێکهاتەکان سەبارەت بە کەرکوك ڕوون بکرێتەوە. لەوکاتەوە کە لەسەرەتای سەدەی بیستەم کەرکوك وەکو ناوچەیەکی گرنگی بەرهەمهێنانی نەوت ئەژمارکرا، ئیدی ئەو شارە بوو بە ئامانجێکی گرنگی کۆچکردن. پاش دۆزینەوەی نەوت لە کەرکوك، ژمارەیەکی زۆری کۆچبەران کە زۆرینەیان خێزانی عەرەب بوون، هاوردەکران بۆ ئەو شارە[3]. ئەوەش دیموگرافیای شارەکەی بە شێوەیەکی بەرچاوە گۆڕی. پاشان پەیتا پەیتا گۆڕانکارییە دیموگرافییەکان لە تەواوی پارێزگایەکە چووە قۆناغێکی ترو سنووری کارگێڕی ئەو پارێزگایەش گۆڕانکاری مەزنی بەسەردا هێنرا.

لە ساڵی(١٩٧٢) ناوی پارێزگای کەرکوك گۆڕدرا بە(تەئمیم)[4]، دواتر کۆمەڵێك گۆڕانکاری لە سنوورە کارگێڕییەکانی ئەو شارە لەلایەن حکومەتی بەعسەوە ئەنجام درا. بۆ نموونە، لە ساڵی(١٩٧٥) ناوچە کوردنشینەکانی چەمچەماڵ‌و کەلارو کفری لە کەرکوك دابڕێندران. دواتریش تووزخورماتوو، کە زۆربەی دانیشتووانی تورکمانن، لە کەرکوك کرایەوەو بە پارێزگای سەلاحەدینەوە لکێندرا. بەمەش ڕووبەری کەرکوك بەشێوەیەکی بەرچاو بچووك کرایەوە. لە ساڵی(١٩٥٠) ڕووبەری کەرکوك بیست هەزار(٠٠٠، ٢٠) کیلۆمەتری دووجا(کم٢) بوو کەچی لە سەرەتای سەدەی بیست‌و یەکەم دا ڕووبەری ئەو شارە تەنیا(٦٧٩، ٩کم٢ مایەوە.[5] مەبەستی سەرەکی لە گۆڕینی سنووری کارگێڕی ئەو شارە بۆ مەرامی سیاسی‌و کەمکردنەوەی قەوارەی پێکهاتەی کوردی بووە لە شاری کەرکوك. ئەو دەستێوەردانە، کاریگەرییەکی گەورەی لە گۆڕینی جوگرافیای ئەو شارە هەبوو.

***(گۆڕینی دیموگرافی):-**

جگە لە گۆڕینی سنووری کارگێڕی کەرکوك، حکومەتی عێراق دەستیکرد بە کەمپینی دەرکردن‌و لابردن‌و ڕاگوازتن‌و هاوردەکردنی خەلك. شایانی باسە گۆڕینی دیموگرافیای کەرکوك دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ساڵانی بیستەکانی سەدەی ڕابردوو کە بەرهەمهێنانی نەوت لەو شارە دەستیپێکرد، بەلام کە حیزبی بەعس لەڕێگەی کودەتاوە لە ساڵی(١٩٦٨)هاتە سەرحوکم، پرۆسەکە چڕتر کرایەوەو لە ساڵانی هەشتاکان‌و نەوەدەکان گەیشتە لووتکە. بەهۆی سیاسەتی بەعەرەبکردن(تعریب) کە لەلایەن ڕژێمی سەدام حوسێنەوە بەڕێوە برا، کۆمەلگای کەرکوك گۆڕانکاری گەورەی بەسەرداهات. پێکهاتەی کوردو نیشتەجێی شوێنی دیکە کران. لەو نێوەشدا، چەندین خێزان کە لە نەتەوەی عەرەب بوون، وزۆر جار بە وافدین ناوزەد دەکرێن،[6] پارەیان پێدەدرا(نزیکەی دە هەزار دیناری عێراقی کە بەرامبەر بە سی هەزار دۆلاری ئەوکاتەیە) وەکو هاندانێك بەمەبەستی بارکردن بۆ شاری کەرکوك‌و نیشتەجێبوون لەسەر زەوییە تازە چۆلکراوەکان[7]. شاڵاوەکانی جینۆسایدی ناسراو بە(ئەنفال)، کە لەسەر دەستی ڕژێمی بەعس ئەنجام دران، پەڵەیەکی ڕەشە لە مێژووی عێراق کە تێیدا سەد هەزار بۆ دووسەد هەزار کورد بوونە قوربانی. شایەنی ئاماژە پێکردنە کە لە دوای دروستبوونی ناوچەی ئارامیش(ناوچەی دژەفڕین) لە کۆتایی ساڵی(١٩٩١)، پرۆسەی بە زۆر دەرکردن لە پارێزگای کەرکوك، کە کەوتبووە دەرەوەی ناوچەی ئارام، هەر بەردەوام بوو، بە ڕادەیەك کە هەتا ساڵی(٢٠٠٣) یش، نزیکەی هەزار کەیسی دەرکردن لە مانگێکدا ئەنجام دەدرا[8].

دەستكەوتنی داتاو ئاماری دانیشتووانی كەركوك بەهۆی ئەو گۆرانكارییە مەزنانە لە دیمۆگرافیای ئەو شارە بەشێوەیەكی بەرچاو ئەستەم بووە. هەربۆیە هەتاوەكو ئێستاش سەرژمێری گشتی ساڵی(١٩٥٧) بەیەكێك لە دروسترین ئامار هەژمار دەكرێت. خۆ سەرژمێری تر لە ساڵەكانی(١٩٧٧و ١٩٩٧) ئەنجامدران، بەڵام، ئەوانە بە باوەڕپێكراو دانانرێن و پشتیان پێ نابەسترێت چونكە لەژێر سەرپەرشتی رژێمی بەعس ئەنجام دروان[٩].

ئیتر دەستێوەردانە بەئەنقەستەكەی رژێمی بەعس لە دیمۆگرافیاو سنووری كارگێری پارێزگای كەركوك، بابەتی ئەنجامدانی سەرژمێری ئەوەندەی تر ئاڵۆز كردووەو كە ئێستا یەكێكە لە بابەتە كێشە لە سەرەكان، بە تایبەتی چونكە ئەنجامدانی ریفراندۆم خاڵە بەهێزو لاوازەكانی پێكهاتەكانی شاری كەركوك دەردەخات. هۆكارێكی تر كە لە ساڵی(٢٠٠٥) بووە بەربەست لەبەردەم ئەنجامدانی سەرژمێری ئەوەبوو كە نەتوانرا بریار بدرێت لەسەر ئەوەی ئایا لە پرۆسەكەدا نەتەوە بكرێت یان نەكرێت. بۆیەش ئاماری نوێ سەبارەت بە پێكهاتەی كۆمەڵگاكانی كەركوك لە بەردەستدا نییە.

*(سەرهەڵدانی گرژییەكان):

لەدوای رووخانی رژێمی سەدام حوسێن، پرسی ناوچە جێناكۆكەكان، بەتایبەتی كەركوك، بووە خاڵێكی ناكۆكی سەرەكی لەنێوان هەولێرو بەغدا. لە سەرەتای ساڵی(٢٠٠٣)، گۆرانكاری نوێ لە رێژەی دانیشتووانی شاری كەركوك رووی دا. لەدوای ئەوەی شارەكە كەوتە ژێر كۆنترۆڵی هێزە كوردییەكان و لە ترسی سەرهەڵدانی توندوتیژی، ژمارەیەك لە خێزانە عەرەبەكان كەركوكیان بەجێهێشت[١٠] لەلایەكی دیكەوە، زۆرێك لە دانیشتووانی كوردی كەركوك لەگەڵ گەرانەوەیاندا بۆ ئەو شارە، بۆیان دەركەوت كە خانووەكانیان لەلایەن خێزانە عەرەبە هاوردەكانەوە رووخێندراوبوون یان داگیركرابوون. بەمەش ژمارەی ناكۆكییەكان لەسەر زەویوزار رووی لە زیادی كرد چونكە خێزانە كوردو توركمانەكان داوای ئەو خانووو زەویانەیان دەكردەوە كە پێشتر لە دەستیان دابوو. لە زۆر حاڵەتدا، زۆران لەو خێزانانە نەیاندەتوانی بچنەوە سەر شوێنی رەسەنی خۆیان، بەڵام بۆ جێكردنەوەی ئاوارەكان هەندێك خێزانی عەرەب بەزۆر دەركران[١١].

بەمەبەستی رێكخستنی گەرانەوەی بەلێشاوی ئاوارەكان، دەسەڵاتی كاتی هاوپەیمانان لە ساڵی(٢٠٠٤) هەڵسا بە دامەزراندنی(دەستەی چارەسەركردنی كێشەكانی خاوەندارێتی زەویوزار). ئامانجی ئەو دەستەیەش بریتی بوو لە سەرپەرشتیكردنی داواكارییەكانی قەرەبووكردنەوە، كە بەشێك بوو لە پرۆسەی بە پێژەوانەكردنەوەی پرۆسەی تەعریب. بەڵام، ئەو دەستەیە، میكانیزمێكی سستی بەرێوەبردنی پەیرەوكردو دەرئەنجام دەستەكە تەنیا توانی رێژەیەكی كەم لەو كەیسە زۆرانە چارەسەر بكات.

پرۆسەی گەراندنەوەی خەڵك بەرهەڵستی زۆری بەدوای خۆیدا هێناو بووە سەرچاوەیەكی نیگەرانی بۆ پێكهاتەی توركمان و عەرەب. ئەو دوو پێكهاتەیە رەخنەی توندیان ئاراستەی دەسەڵاتی كوردی دەكرد بەوەی كە پرۆسەیەكی نارێك و بێسەروبەری گەرانەوەیان پەیرەوكردووە. پارتە سیاسییە كوردییەكان تۆمەتباركران بە كارئاسانیكردن بۆ گۆرینی دیمۆگرافیای شاری كەركوك لە بەرژەوەندی لایەنی كوردی، ئەویش بۆ ئەو ئەگەرەی كە لە هەر دەنگدانێكی داهاتوودا، گەراندنەوەی ئاوارەكان بە قازانجی پێكهاتەی كوردی بشكێتەوە. ئەوەش لەلایەن بەرپرسێكی باڵای توركمان ئامارەی پێكراو وتی، ژمارەی دانیشتووانی كەركوك بە شێوەیەكی بەرچاو زیادیكرد بە هۆی گەراندنەوەی كوردەكان[١٢].

بێگومان كۆنترۆڵكردنی شەپۆلی گەرانەوەی ئاوارەكان بۆ كەركوك كارێكی ئاسان نەبووە لەبەرئەوەی لە دوای ساڵی(٢٠٠٣)، خەڵكانێكی زۆر دەستیان بە گەرانەوە كرد. بەبێ رەچاوكردنی هاندەرە سیاسی و كۆمەڵایەتییەكانی پشت گەرانەوەی ئەو ژمارە ئێجگار زۆرەی ئاوارەكان، پرۆسەكە بەیاسایی ئەژمار نەكرا لەبەر نەبوونی حكومەتێكی بەتوانا لەو كاتەدا.

بەتێپەربوونی دواوادەی ئەنجامدانی ریفراندۆم لە كانوونی یەكەمی ساڵی(٢٠٠٧)، بارودۆخی شاری كەركوك وورده وورده خراپتر بوو. لایەنە یاخیبووەكان فرە ئاینی و فرە نەتەوەیی پارێزگای كەركوكیان بەگونجاو زانی بۆ زیادكردنی توندوتیژی مەزهەبی. هەر بۆیە لە ساڵی(٢٠٠٧) كەركوك بووە چەقی ململانێ و ژمارەی قوربانییە سڤیلەكان گەیشتە بەرزترین ئاست لەوەتەی جەنگی دووەمی كەنداوەوە[١٣].

كەركوك تەنیا شارێكی دەوڵەمەند بە نەوت نییە، بەڵكو بووەتە سیمبولێك بۆ هەر سێ پێكهاتە سەرەكییەكەی شارەكە كە بۆ مەبەستی سیاسی و كۆمەڵایەتی و ئابووری بەكار دەهێندرێت. لەوەش زیاتر، ئەو سیمبولە وەكو پێوەرێكی تایبەتمەندێتی هەر یەك لەو پێكهاتانە بەسەرییەكدا بەكاردەهێنرێت. لەم حاڵەتەشدا، كاتێك كە سیمبولەكان دەبنە نیشاندەری بەهاو قورسایی كۆمەڵگاكان، سازشكردن لەسەریان كارێكی زۆر قورس دەبێت[١٤].

لەدوای ئەو گۆرانكارییە مەزنانەی كە لە حوزەیرانی ساڵی(٢٠١٤) لە سەرانسەری عێراق روویاندا، پشێوی لە پەیوەندی نێوان پێكهاتە جیاوازەكانی كەركوك رووی لە زیادبوون كرد. پێویستە ئەوە بوترێت كە كێشەی كەركوك بچووككراوەی كێشەكانی عێراقەو چارەسەركردنی دەوەستێتە سەر پاراستنی متمانەو هاوكاری لەنێوان پێكهاتە جیاوازەكانی پارێزگاكە. بەڵام لەوانەیە رووداوەكانی ساڵی(٢٠١٤) بەشێوەیەكی بنەرەتی داهاتووی كەركوكی گۆرِیبێت.

*(كەركوك لە دوای كەوتنی موسڵ):

تەشەنەكردنی چەكدارانی دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شام(داعش) لە حوزەیرانی ساڵی(٢٠١٤) بۆ ناوەوەی عێراق، بووە هۆی شڵەژانێكی بێ پێشینەی دینامیكییەتی ناوخۆی عێراق.

لەمیانی كشانەوەی بێشوماری سوپای عێراق، رێكخراوی داعش توانی لە(١٠)ی حوزەیرانی ئەو ساڵە كۆنترۆڵی دووەم شاری عێراق(شاری موسڵ) بكات. دوابەدوای وەدەستهێنانی

سەرکەوتنێکی وا سەرسوورهێن، چەکدارانی دەوڵەتی ئیسلامی روویان کردە ناوەراستی عێراقو چەندین شاری ستراتیژی تریان داگیر کرد، ئینجا چەندین ناوچەی فراوانی دیکەیان بە درێژایی شاری دیالە لە رۆژهەلاتی عێراق هەتا ناوچەکانی نزیك حەلەب لە رۆژئاوای سوریا کۆنترۆڵ کرد. بەوپێیە، لە ماوەی تەنیا دوو هەفتەدا رووبەرێکی زۆری عێراق کەوتە دەست دەولەتی ئیسلامیو هێزە ئەمنییەکانی عێراقیش تووشی شکستێکی تەواوەتی بوونو بەغدا کەوتە سەر لێواری کەوتن. ئیتر ئامادە بوونی داعش لە ئەنبار، نەینەوا، سەلاحەدین، دیالە، کەرکوك، بابلو بەغدا، روونو ئاشکرا بوو.

بەلام بارودۆخەکە لە هەرێمی کوردستان بەجۆرێك لە جۆرەکان جیاواز بوو، هەر لەگەل پەلهاوێژی چەکدارانی داعش بەرەو باشوورو دارمانی هێزە ئەمنییەکانی عێراق، هێزە ئەمنییەکانی کوردستان پێشرەویان بۆ ناوچە جێناکۆکەکان نێوان هەولێرو بەغدا کرد، واتە ناوچەکانی ژێر ماددەی(١٤٠).

بۆ کورد، کۆنترۆلکردنی ناوچە جێناکۆکەکان لەلایەن هێزەکانی پێشمەرگەوە تەنیا قۆستنەوەی دەرفەت نەبوو، بەلکو پێویستیەك بوو، چونکە هێزە ئەمنییەکانی عێراق رووبەرێکی فراوانی ناوچە جێناکۆکەکانیان بەبێ بەرگری بەجێهێشت. ئیتر لەو کاتەدا چەکدارانی داعش دەستیان کردبوو بە کۆنترۆل کردنی چەندین شارو شارۆچکە، هەربۆیە بەرپرسیارێتی پاراستنی ناوچە جێناکۆکەکان کەوتە ئەستۆی لایەنی کوردی. هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان بە رەزامەندییەکی ناوەرۆکیی(ضمني) حکومەتی بەغداو بەشێوەیەکی کاریگەر ئەو بۆشاییەیان پرکردەوە کە لە دوای چۆلکردنی هێزە ئەمنییەکانی عێراق بە جێمابوو.

*(سنووری نوێ):

بارودۆخی دوای حوزەیرانی سالی(٢٠١٤) بووە مایەی دروستبوونی سنوورێکی نوێ بەدرێژایی هەزارو پەنجا کیلۆمەتر. تەنیا پەنجا(٥٠)کم لەو سنوورە نوێیە لەلایەن هێزە ئەمنییە عێراقییەکانەوە دەپارێزرا. ئەوەی مابوو دەیکردە هەزار(١٠٠٠)کم لەیەن هێزە ئەمنییەکانی کوردستان پارێزگاری لێدەکرا. بەگوێرەی ووتەکانی ئەمینداری گشتی وەزارەتی پێشمەرگە، هێلێکی ستراتیژی نوێ دروستکراوەو ئەو ناوچەنەی کە هێلەکە لە خۆی دەگرێت بریتین لە نەفتخانە، جەلەولا، سەعدیە، قەرەتەپە، باشوورو رۆژئاوای دووزخورماتوو لەگەل رۆژئاوای کەرکوك. ئەوەش سەرەرای ناوچەکانی دیبەگە، مەخموورو تا دەگاتە فیشخابوور. ئەو هێلە(١٠٥٠) کیلۆ مەتریە لەلایەن هێزەکانی یەکەی(٧٠و ٨٠)ی هەرێمی کوردستانو یەکەکانی فریاکەوتنی خێراو ئاسایشو زێرەڤانی بەرگری لێدەکرێت. لە ماوەی چەند رۆژی رابردوودا هێزەکانی پێشمەرگە هەلساون بە شوێنگرتنەوەی گشت ئەو ناوچانەی کە سوپای عێراق چۆلیکردوون کە ئەو ناوچانەی هێزە هاوبەشەکان بەرگریان لێدەکرد، دەگرێتەوە[١٥].

کەرکوك بەدەر نەبوو لەو شەرەی کە بەرۆکی عێراقی گرتووە. هێزە ئەمنییەکانی عێراق شوێنەکانیان لە پارێزگاکە چۆلکردو ئەو شارە ستراتیژییەو سامانە نەوتییەکەیان بەبێ پارێزگاری بەجێهێشت. هێزەکانی ئۆپەراسیۆنی دیجلەش، کە لەژێر فەرمانی راستەوخۆی سەرۆك وەزیرانی ئەوکات(نوری مالیکی) بوون، لە کەرکوك کشانەوە. هێزەکانی دیجلە، کە لە بەرواری ٣ی تەمموزی سالی(٢٠١٢) پێکهێنرا ولە چەندین بەشی ناوچە جێناکۆکەکان بلاو بووبوونەوە، لەژێر فەرماندەی فەریق روکن(عەبدولئەمیر زەیدی) بوون، کە پێشتر فەرماندەی گشتی هێزەکانی دیالەی پێ سپێردرابوو. هێزەکانی دیجلە پێشتر لە کەرکوكو دیالەو سەلاحەدین ئامەدەبوونیان هەبوو، بەلام ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك ئامادەبوونی ئەو هێزانەی لە قەزای کەرکوك رەتکردەوە. لە پارێزگای کەرکوك، هاوشێوەی ناوچە جێناکۆکەکانی دیکە، هێزە ئەمنییەکانی کوردستان توانیان ئەو بۆشاییە پربکەنەوە کە لە کشانەوەی هێزە ئەمنییەکانی عێراق دروست ببوو. هەلبەتە تێکرای پارێزگای کەرکوك لە ژێر کۆنترۆلی هێزەکانی پێشمەرگە نەبوو، بەلکو لە ١٠ی حوزەیران، چەپۆکی دەولەتی ئیسلامی گەیشتبووە حەویجەو ئەلزابو ریازو عەباسی، دواتر ناوچەکانی وەك مەلا عەبدوللاو تەلوەرد بوونە شانۆی شەرێکی سەخت. تاوەکو ئێستاش، پارێزگای کەرکوك دوولەتە، بەشێوەیەك کەوا حەویجەو ناوچەکانی باشووری پارێزگاکە کەوتوونەتە ژێر دەستی داعشو شاری کەرکوكو بەشی رۆژهەلاتی پارێزگایەکە کەوتونەتە ژێر دەستی پێشمەرگە. بەو پێیە، نزیکەی ٤٥٪ ی رووبەری کەرکوك هێشتا نە لەژێر دەستی پێشمەرگەیەو نە لەژێر کۆنترۆلی هێزەکانی ئەمنی عێراقدایە(بروانە نەخشەی ژمارە٢).

پێش حوزەیرانی سالی(٢٠١٤)، سنوورێکی سەربازی دیفاکتۆ لە پارێزگای کەرکوك هەبوو. بەرزاییەکانی کانی دۆملان وەك سنوورێکی سروشتی بوو لەنێوان هێزەکانی پێشمەرگەو هێزە ئەمنییەکانی عێراق(سەیری نەخشەی ژمارە ١ بکە). هیچ هێزێکی ئەمنی فیدرالی نەیدەتوانی بۆ باکووری رۆژهەلاتی ئەو هێلە سنوورییە بپەرێتەوەو هێزەکانی پێشمەرگە کۆنترۆلی ئەو ناوچەیان دەکرد. ئیتر ناوچەی " کانی دۆملان ببووە ناوچەی قەدەغەکراو"[١٦].

بابەتی کۆنترۆلکردنی کەرکوك لەلایەن کوردەوە بەسانایی لە باشووری عێراق تێنەپەری. هادی ئەلعامری، فەرماندەی لیواکانی رێکخراوی(بەدر) لە کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانیدا لە شاری کەرکوك ووتی، پێشمەرگە تەنیا بە مۆلەتی حکومەتی بەغدا لە کەرکوك دەمێنێتەوە[١٧].

لەداهاتوودا بارودۆخی ئەمنیو چۆنییەتی پاراستنی کەرکوك زۆر گرنگە بۆ بەرقەراربوونی سەقامگیری لەو شارە. وە پێویستە ئامادەبوونی بەردەوامی هێزەکانی پێشمەرگە لەو شارە لە رێگەی رێکەوتنێکەوە لەنێوان هەولێرو بەغدا بە فەرمی بناسرێت. بەم جۆرە گرژییەکان کەم دەبنەوەو بارودۆخێکی سەقامگیر لە کەرکوك فەراهەم دەبێت. شایەنی ئاماژە پێکردنە کە وەزیرێکی پێشووی حکومەتی عێراقی ئاشکری کرد، سەبارەت بە باری ئاسایشی ئەو شارە کە

ئێستا کورد کۆنترۆڵی کردووە، بەڵام ئەو کۆنترۆڵکردنە چوارچێوەی یاسایی نییە[18].

هەرچەندە لە رووی سیاسییەوە زۆر ئەستەمە بۆ بەغدا ئەو بارودۆخەی ئێستا بەرێوە ببات، بەڵام رێکەوتنی فەرمی بۆ بەردەوامی پێشمەرگە لە پارێزگای کەرکوك ئامادەیی بەغدا پیشان دەدات بۆ ئەوەی لە داهاتوودا ریگەنەدات بەغداو هەولێر سەبارەت بە کەرکوك بگەنە بنبەست. هەر جۆرە رێککەوتنێك لەسەر ئامادەبوونی هێزەکانی پێشمەرگە بکرێت پێویستە پەیوەستبوونی هەردوولا بەهێشتنەوەی کەرکوك وەکو ناوچەیەکی داماڵراو لە جموجۆڵی سەربازی لە خۆبگرێت.

ترس و نیگەرانی بەغدا بەرامبەر بە کەرکوك ئەوەیە کە هەر دەستکەوتێکی لایەنی کوردی لەو شارە وەدەستی بێنێ بە هەنگاونان بەرەو سەربەخۆیی ئەژمار دەکرێت. جێی باسکردنە کە لە حوزەیرانی ساڵی(٢٠١٤) سەرۆکی هەرێمی کوردستان مەسعوود بارزانی ئاماژەی بەوەدا کە کورد لەوانەیە ریفراندۆم لەسەر سەربەخۆیی لە ماوەی چەند مانگێکی ئایندەدا ئەنجام بدات. دوای کەوتنی موسڵ بە ماوەیەکی کەم، سەرۆکی هەرێم سەردانێکی سیمبوڵی بۆ کەرکوك ئەنجام دا، ئەویش بۆ نیشاندانی گرنگی ئەو شارە بۆ کورد.

بەڵام، بانگەشەی سەربەخۆیی بەهۆی کاریگەرییە ئابووری و ئەمنییەکانی دوای کۆنترۆڵکردنی ئەو ناوچە نوێیانە کز بوو. لە مانگی ئاب، قەیرانی شنگال و مەسەلەی بەرپرسیارییەتی و کاریگەری کۆنترۆڵکردنی ناوچەیەکی بەرفراوانی ئەوتۆ، بانگەشەکانی سەربەخۆیی هەڵپەسارد. لە کەرکوکیش گرانی و زەحمەتی ئەرکی کۆنترۆڵکردن و پاراستنی ئەو ناوچانە درکی پێکرا. تەنیا لە حوزەیران تاوەکو تەممووزی ساڵی(٢٠١٤)، لە پارێزگای کەرکوك سیوسێ(٣٣) پێشمەرگە گیانیان لەدەست داو ٩٨ی دیکەش بریندار بوون[19].

*(ئاوارەکان):

شەپۆلی گەورەی ئاوارەکان یەکێك بوو لەو ئەرکە گەورانەی کە پێویست بوو لە ئەستۆ بگیردرێت. لە ١٠ی حوزەیرانی ساڵی(٢٠١٤) بەولاوە، هەرێمی کوردستان رووبەرووی چەندین شەپۆلی ئاوارەکان بووەوە کە بەدوای پەناگە لە ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی کورد دەگەران.

پارێزگای کەرکوك لە شەپۆلی ئاوارەکان بەدەر نەبوو، پێشتریش بەهۆی قەیرانی شاری ئەنبار ژمارەیەکی زۆر ئاوارەی لە خۆگرتبوو. بە گوێرەی راپۆرتەکان، تاوەکو نیسانی ساڵی ٢٠١٤ نزیکەی ١٢٧٨٠ ئاوارە لە شاری کەرکوك نیشتەجێ کرابوون[20]. ئەو ژمارەیە بەرزبوونەوەیەکی یەکجار زۆری بەخۆیەوە دیووە، بە جۆرێك(رێکخراوی نێودەوڵەتی کۆچبەران) لە کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٥ ئاماژەی بە تۆمارکردنی کۆی گشتی ٢٣٨٧٧٦ ئاوارە کرد لە پارێزگای کەرکوك. لەوانە ٩٤٧٨٢ کەسیان لە پارێزگای سەلاحەدینەوە هاتبوون، کە ئەوکات ببووە شوێنی پێکدادان بەتایبەتی لە ناوچەکانی تکریت و بێجی. جێی پێکردنە که کەرکوك ژمارەیەکی ئێجگار زۆر ئاوارەی لە خۆگرتووە، بە ئاستێك کەوا ژمارەیان گەیشتە ١٥٧٤٧٦ کەس، لەوانە ٤٠٠٨٠ کەس لە باڵەخانەی تەواو نەکراوەو چادرگەی نافەرمی دەژین[21].

هەڵاوسانی ژمارەی ئاوارەکان لە کەرکوك بەدرێژایی ساڵی(٢٠١٤)، نیگەرانی ئاسایشی لێکەوتەوە. ئەو نیگەرانییانە بریتی بوون لە گومانکردن لە دزەکردنی کەسانی توندرەو لەگەڵ ئەو خەڵکانەی کە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی داعش بەرەو کەرکوك هەڵدێن. لەلایەکی تریشەوە، لە پارێزگای کەرکوك وە تایبەتی لە ناوشاری کەرکوك، مەترسی لە بوونی شانەی نوستوو هەیە. دەشێت بوترێت کە رەنگە شەری داعش پەیوەندییە لێکترازاوەکەی نێوان پێکهاتە جیاوازەکانی شاری کەرکوك زیاتریش بشەڵەقێنێ و درزی لەوە گەورەتر دروست بکات، چونکە زۆرینەی چەکدارانی داعش لە پێکهاتەی عەرەبی سوننەن. ئەوەش رەنگە لە کەرکوك ببێتە هۆی دروستبوونی رق و کینە بەرامبەر بە پێکهاتەی عەرەبی سوننە[22].

پێکهاتەی دیمۆگرافی هەمەچەشنی کەرکوك گرنگییەکی ستراتیژی هەیە بۆ دەوڵەتی ئیسلامی، چونکە پاش ئەوەی چەکدارانی داعش لە دیالە دەرکران و بەرەو باکوور هەڵکشان، جەختیان کردە سەر پارێزگای کەرکوك بۆ ئەنجامدانی توندوتیژی. هەڵبەتە سەرکەوتنی ئەو رێکخراوەش لە عێراق پەیوەستە بە تواناکانی لە بەکارهێنانی بارگرژییە کۆمەڵایەتییەکان بە قازانجی خۆی. بۆیە واپێدەچێت کە هەمان شت لە کەرکوك ئەنجام بدات.

*(هەولێر و بەغدا):

بارودۆخی پەیوەندی نێوان هەولێر و بەغدا بەهەستیاری ماوەتەوە. سەرەرای ئەوەی کە بەغدا لەسەرەتادا، رازی بوو بە بڵاوبوونەوەی هێزەکانی پێشمەرگە لە پارێزگای کەرکوك. بەڵام ئەو کۆنترۆڵە ئیدارییە دیفاکتۆیە کوردییەی کە لە دەرئەنجامی ئەو بڵاوبوونەوەیە هاتە کایەوە، گرژی لە پەیوەندی نێوان هەردوو ئیدارە دروست کردووە. هەرچەندە سەرکردایەتی کوردی پێی وابوو کە دەبێت پرسی کەرکوك و ناوچە جیناکۆکەکان یەکێك بێت لە خاڵەکانی ئەجێندای دانووستانەکان لەنێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی بەغدا، بەڵام، لەبەر جەخت کردنە سەر پرسی ئابووری، رەنگە پرسی کەرکوك وەك زۆربەی کێشە دژوارەکان بخرێتە لاوە. ئەوەش خۆ دزینەوەیە لەو راستییەی کە بەبێ چارەسەرکردنی پرسی ناوچە جێناکۆکەکان، زۆر ئەستەمە هەولێر و بەغدا بتوانن پەیوەندییەکی سەقامگیریان هەبێت.

رۆڵی میلیشیا شیعییەکان و حەشدی شەعبی لە کەرکوك وەك پرسێکی ناکۆکی دروستکەر ئەژماردەرێت. بۆ نموونە لێدوانەکانی قەیس خەزعەلی، سەرۆکی(عەسایب ئەلحەق)، بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کە کەرکوك شارێکی عێراقییەو لێناگەرێت ببێتە بەشێك لە هەرێمی کوردستان. ئەوەش دەریدەخات کە ئەو گرووپە چەکدارە لەسەر پرسی کەرکوك بۆچوونی خۆی هەیە. دوای بەدەستهێنانی زنجیرەیەك سەرکەوتن لە دژی چەکدارانی داعش لە ناوچەکانی دیالەو

سەلاحەدین، میلیشیا شیعەکان پەیتا پەیتا لە ناوچەکانی باکووری پارێزگای کەرکوك بڵاوبوونەوە، پاشان روویان لەو پارێزگایە کرد هەتا گەیشتنە شارۆچکەی دووزخورماتوو.

دوای ئەوە، لە ناوچەکانی باشووری کەرکوك بڵاوبوونەوە، بە زۆری لە ناوچەی تازەخورماتوو. هەڵبەتە چەکدارانی حەشدی شەعبی لە کەرکوك بە زۆری لە تورکمانە لۆکاڵییە شیعەکانی شارەکە پێکدێن و بێگومان هەوڵدەدەن لە کەرکوك بمێننەوە و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان لەو پارێزگایە فراوان بکەن، بەڵام زەحمەتە لایەنی کوردی چالاکی ئەو چەکدارانە لە چوارچێوەی شاری کەرکوك قبوڵ بکات. بۆیە ئەوەش ئەگەری ئەوە پیشاندەدات کە لەوانەیە کەرکوك ببێتە خاڵی پێکدادان لەنێوان هەولێرو بەغدا. لێرەدا گرنگە ئاماژە بەوە بکرێت کە رەنگە هێشتنەوەی پرسی کەرکوك بەبێ بوونی پرۆسەیەکی سیاسی و چوارچێوەیەك بۆ رێککەوتن، گرژییەکان زیاتر تەشەنە بکەن.

بارودۆخی کەرکوك زۆر بە ناسەقامگیری ماوەتەوە. لەگەڵ بەردەوامی شەر لە ناوچەکانی وەك مەلا عەبدوڵڵا، تەلوەردو مەکتەب خالید، پێدەچێت کەرکوك وەك سەرچاوەیەکی سەرهەڵدانی گرژی بمێنێتەوە، نەك تەنیا بەهۆی هەرەشەکانی دەوڵەتی ئیسلامییەوە، بەڵکو بەهۆی بارگرژییەکان لە پەیوەندی نێوان هەولێرو بەغدا. بارودۆخی ناهەمواری ئابووری و دابەزینی نرخی نەوتیش پەیوەندی نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی بەغدا دەخاتە ژێر فشارێکی زیاترەوە. ئەو خاڵانەو ئامادەبوونی گرووپە چەکدارە شیعە جۆراوجۆرەکان، کە هەندێکیان بەسەربەخۆیی و دوور لە کۆنترۆڵی بەغدا هەڵسوکەوت دەکەن، وادەگەیەنێت کە رەنگە کەرکوك ببێتە مەیدانێك بۆ ململانێ سیاسییەکان لە داهاتوودا.

*(ماددەی ١٤٠ گرفتەکانی جێبەجێکردن):

لە ساڵی(٢٠٠٥)، ماددەی(٥٨)ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت بۆ قۆناغی گواستنەوە(قانون ادارة الدولة للمرحلة الإنتقالية) کرا بە بەشێك لە ماددەی(١٤٠)ی دەستووری هەمیشەیی عێراق. هەرچەندە خوودی ماددەی(١٤٠) یش بە شێوازێکی کورت نووسراوەتەوە، بەڵام ئەو ماددەیە ئاماژە بەوە دەکات کە وردەکارییەکانی ماددەی(٥٨) دەبێ جێبەجێ بکرێن. ئاساییکردنەوە، وئەنجامدانی سەرژمێری و ریفراندۆم ئەو هەنگاوانەن کە لە ماددەی ١٤٠ دا باسکراون ولەم بەشانەی خوارەوە هەریەك لەو هەنگاوانە بە رەچاوکردنی روانگەی پێکهاتەکانی شاری کەرکوك شرۆڤە دەکرێن.

*(ئاساییکردنەوە):

سەبارەت بە پرۆسەی ئاساییکردنەوە، لە ماددەی(١٤٠)ی دەستووری عێراقدا، کە ئاماژە بە ماددەی(٥٨)ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت بۆ قۆناغی گواستنەوە دەکات، هاتووە کە دەبێت بە " خێرایی.. ئەو نارەواییانەی بەهۆی کردارەکانی رژێمی رابردووەوە ئەنجامدراون بەمەبەستی گۆڕینی دیمۆگرافیای چەند ناوچەیەك، وەکو کەرکوك.. پێچەوانە بکرێنەوە[٢٣].

لە ماددەی(٥٨)ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت بۆ قۆناغی گواستنەوە پرۆسەی ئاساییکردنەوە لە چوار خاڵ پێکدێت:

١- قەرەبووکردنەوەی دارایی ئەو کەسانەی لە کەرکوك دەرکراون(ئاوارەکان) و ئەو هاوردانەی کە ئامادەن بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنانەی لێیەوە هاتوون.

٢- راستکردنەوەی باری نەتەوایەتی(تصحيح القومية).

٣- چارەسەرکردنی کێشەی خاوەندارێتی زەویوزار.

٤- گەڕانەوەی سنووره ئیدارییەکانی کەرکوکی پێش هاتنی رژێمی بەعس.

بەڵام هەردوو ماددەی(١٤٠)و ماددەی(٥٨) رێکارەکانی ئەنجامدانی ئەو خاڵانەی سەرەوەیان دەستنیشان نەکردووە. سەرەرای ئەوەش، ناروونی لە نووسینی ماددەی(١٤٠) دا بەشێوەیەك بەدی دەکرێت کە بووەتە هۆی سەرهەڵدانی ململانێ و ناکۆکی لایەنەکان لە کەرکوك.

سەرباری ململانێ و ناکۆکییەکان، ئەو پرۆسانەی کە پەیوەندییان بە جێبەجێکردنی ماددەی(١٤٠) هەیە پێویستیان بە چاودێریکردن و وردبینییە. بۆ نموونە، دوای ساڵی(٢٠٠٣)، دارایی بۆ ئەو خێزانە هاوردانە تەرخانکرا کە ئارەزووی گەڕانەوەیان هەبوو بۆ ناوچەکانیان، بە مەرجی گەڕانەوە لە ماوەی ٤٠ رۆژ پاش وەرگرتنی بڕی پارەی تەرخانکراو[٢٤].

شایەنی باسە کە جگە لەوەی ژمارەی هاوردەکان وەکو ئامار لە بەردەستدا نییە، باس لەوە دەکرێت کە ژمارەیەك لە خێزانە هاوردەکان قەرەبووکراونەتەوە. بەڵام شاری کەرکوکیان بەجێنەهێشتووە. تەنانەت باس لەوەش دەکرێت کە هەندێك لەو خێزانانە بڕی پارەی قەرەبووکردنەوەکەیان بەکارهێناوە بۆ نۆژەنکردنەوەی خانووەکانیان هەر لە نێو شاری کەرکوك[٢٥].

لە لایەکی ترەوە لایەنە پەیوەندیدارەکانی کەرکوك رایانگەیاندوە کە زەویان ئەوەندە نییە بۆ ئەوەی بەسەر خێزانە ئاوارەکان دابەش بکرێت. یەکێك لەو هۆکارانە بۆ ئەو راستییە دەگێڕنەوە کە پاش رووخانی رژێمی بەعس لە(٢٠٠٣)، زۆرێك لە زەوییەکانی شاری کەرکوك بە شێوەیێکی نایاسایی لەلایەن خەڵکەوە بەکارهێنراون.

لە ئێستادا پێکهاتەکانی شاری کەرکوك ناکۆکییان دەرنەبڕیوە بەرامبەر بە پرۆسەی قەرەبووکردنەوەی دارایی، بەڵکو نوێنەرانی پێکهاتەکانی عەرەب و تورکمان و کورد پشتگیری خۆیان بۆ دەربڕیوە، چونکە پرۆسەکە پەیوەستە بە ماف و شایستەی خەڵکەوە[٢٦].

بەڵام لەهەمان کاتیشدا ویستی بەغدا بۆ تەواوکردنی ئەو بابەتە کە یەکەمین هەنگاوی جێبەجێکردنی ئاساییکردنەوەیە، بە گومانەوە تەماشای دەکرێت و بگرە ژمارەیەکی بەرچاوی نوێنەرانی پێکهاتەکانی شاری کەرکوك قەرەبووکردنەوەی داراییان وەکو بەربەست لەبەردەم جێبەجێکردنی پرۆسەی ئاساییکردنەوە دانا[٢٧].

یەکێك لە بەرپرسەکانی شاری کەرکوك لەم بارەیەوە رایگەیاند کە بەو میکانیزمەی ئێستا پەیڕەودەکرێت، تەنیا قەرەبووکردنەوەی دارایی زیاتر لە ٢٠ ساڵی تر دەخایەنێت

بۆ ئەوەی تەواو بێت، ئەوە ئەگەر حکومەتی بەغدا ساڵانە ١٧ ملیار دینار بنێرێت[٢٨]. هەروەها گوتی "ئۆفیسی کەرکوک لە ئێستادا ساڵانە ١٧ ملیار لە خەرجیە سیادییەکان وەردەگرێت کە لە ساڵی(٢٠١٥) وابڕیارە کەم بکرێتەوە... وە بۆ ئەوەی قەرەبووکردنەوەی دارایی تەواو بێت، بڕی ٦٠٠ ملیار دیناری دەوێت[٢٩].

شایانی باسە کە لە ساڵی(٢٠٠٧) تا ساڵی ٢٠١٤ لە نێو ١٢٠٣٢٠ مامەڵەی پێشکەشکراودا لەلایەن ئاوارەکانەوە، ٦١٤٦٦ کەیس هێشتا قەرەبوو نەکراونەتەوە. سەبارەت بە هاوردەکان، لە تێکرای ٢٨٣٨٤ کەیسدا تەنیا ٥٧٧٤ کەیس قەرەبوو نەکراوەتەوە[٣٠].

*** (کێشەی خاوەندارێتی زەویوزار):**

ئەو بەشەی پرۆسەی ئاساییکردنەوە دوو بابەت لە خۆ دەگرێت: کێشەی خاوەندارێتی زەویوزاری ناوەکی و کێشەی زەوییە کشتوکاڵییەکان. سەرچاوەی ئەو کێشەی دواییان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بڕیارانەی کە ڕژێمی بەعسی دەریکردن، کە بەهۆیانەوە ملیۆنێک و دووسەد هەزار(١٢٠٠٠٠٠) دۆنم زەوی کشتوکاڵی دەستی بەسەردا گیراو پاشان دابەشکران.

دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام لە ساڵی ٢٠٠٣، ئاوارەکان داوای گەڕاندنەوەی زەوییەکانیان کردو بەوەش بابەتی چارەسەرکردنی کێشەی خاوەندارێتی زەویوزار بووە یەکێک لە بابەتەکانی کارنامەی حکومەت لەو کاتەدا.

پەیوەست بەم بابەتە، پێکهاتەی تورکمان گلەیی و گازندەی خۆیان هەیە. یەکێک لە ئەندام پەرلەمانەکانی پێکهاتەی تورکمان لە بەغدا ئاماژەی بەوەکرد کە " بەشێوەکی فەرمی تەنیا یەک مەتر لە زەوی تورکمانەکان نەگێڕدراوەتەوە بۆ خاوەنەکانیان[٣١]. هەرچەندە هەندێک لە خاوەنداره کوردەکان بە شێوەکی نافەرمی لە دوای ساڵی(٢٠٠٣) زەوییەکانیان وەرگرتەوە، بەڵام چونکە پرۆسەکە نافەرمی بوو، ئەو خاوەندارانە مافی سوود وەرگرتنیان لە خزمەتگوزارییەکانی حکوومەت نییە.

ئەو کێشانە بەبێ چارەسەر ماونەتەوەو دیارە یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکان نزمی ئاستی سەروەرێتی یاسایە. لەهەمان کاتدا بابەتی ئاڵۆزی تریش هەن کە کێشەکانیان زیاتر قووڵکردووەتەوە. بۆ نموونە، زەوییە کێشە لە سەرەکان بۆ چەندین جار مامەڵەی کڕین و فرۆشتنیان لە سەرکراوەو ئەو دەست و ئەو دەستیان کردووەو ئەوەش وایکردووە کە چارەسەر کردنی ئەو بابەتە قورستریش بێت. جێی ئاماژەیە کە دەستەی کێشەکانی خاوەندارێتی زەویوزاری عێراقی ئۆفیسی لە کەرکوک هەیەو مامەڵەی نزیکەی ٨٨٠٠ کەیسی کردووە، بەڵام ئامار لە بەردەستدا نییە بۆ زانینی ڕێژەی کەیسە چارەسەر کراوەکان. ئەوەی ماوە لە ئۆفیسی کەرکوک تەنیا نزیکەی ٥٠ کەیسە. کە دەستەی کێشەکانی خاوەندارێتی عێراق تەنیا کار لەسەر ئەو کێشانە دەکات کە دەگەڕێنەوە بۆ پێش پرۆسەی ڕزگارکردنی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣و زۆربەی مامەڵەکان کاتی زۆر دەخایەنن، چونکە بڕیارەکانی ئەو دەستەیە لە دادگای تێهەڵچوونەوە تانەیان لێدەدرێت. بە گوێرەی یاسای ژمارە ٢٩ی ساڵی(٢٠١٢) کە لە ئەنجوومەنی وەزیرانی بەغداوە دەرچووە، پێویستە تێکرای بڕیارەکانی(لیژنەی کاروباری باکوور، لجنة شؤون الشمال)ی هەڵوەشاوە لە پرەنسیپدا هەڵبووەشێتەوە، چونکە ئەو بڕیارانە بەمەبەستی هەڵوەشانەوەی گرێبەستە کشتوکاڵییەکان و لەناوبردنی مافی کارپێکردنی زەوی کشتوکاڵی دەرکرابوون. بە جێبەجێکردنی بڕیاری ژمارە ٢٩ کێشەی خاوەندارێتی بازێکی گەورەی بەرەو چارەسەرکردن دەنا، کەچی ئەو بڕیارە تا ئێستا جێبەجێنەکراوە. هەروەها پێویستە لایەنی پەیوەندیدار ڕێنمایی دەربکات بۆ قەرەبووکردنەوەی دارایی ئەو کەسانەی کە زەوییەکانیان بەکارهێندراون و باڵەخانەی دەوڵەتیان لەسەر دروستکراون.

*** (سنووری ئیداری شاری کەرکوک):**

لە کانونی یەکەمی ساڵی(٢٠٠٧)، لیژنەی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ پێشنیازێکی پێشکەش بە ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی عێراق کرد سەبارەت بە گەڕانەوەی هەموو ئەو قەزاو ناحییانەی کە لە کەرکوک دابڕێندرابوون و ئێستا لەژێر دەسەڵاتی هاوبەشی هەردوو حکومەتی عێراق و کوردستانن بۆ سەر سنووری ئیداری شاری کەرکوک، ئەوەش ناوچەکانی چەمچەماڵ و کفری کەلارو دووز دەگرێتەوە. بەمەش سنوورە ئیدارییەکەی ساڵی(١٩٧٥)ی کەرکوک دەگەڕێتەوە[٣٢].

گۆڕینی سنووری ئیداری ئێستای کەرکوک، لەلایەن پێکهاتەکانی عەرەب و تورکمانەوە وەک بەربەستێکی جددی لە بەردەم جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ ئەژمار دەکرێت. ئەو دوو پێکهاتەیە بەرهەڵستی گەڕاندنەوەی سنوورە ئیدارییەکانی کەرکوک دەکەن، چونکە لە ڕوانگەی ئەوان ئەو بابەتە تەنیا پەیوەست نییە بە پارێزگای کەرکوک، بەڵکو ناوچەی دیکەی عێراقی دەگرێتەوە. بە بڕوای پێکهاتەی عەرەب و تورکمان، گەڕاندنەوەی سنوورە ئیدارییەکانی کەرکوک بە تەنیا، پێویستی بە ڕێککەوتنێکی سیاسییە لەلایەن تێکرای لایەنەکانەوە، ئەوەش خۆی لە خۆیدا کارێکی زۆر ئەستەمە.

بەڵام زۆرینەی لایەنەکانی کوردی لەگەڵ گەڕانەوەی سنوورە ئیدارییەکانی شاری کەرکوکن، لەبەر ئەوەی بەگەڕانەوەی سنووری ئیداری کەرکوکی ساڵی (١٩٧٥)، پێکهاتەی کوردی دەبێتە زۆرینە لەو پارێزگایە. بەگوێرەی دەستووری عێراقی، پێویستە ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی عێراق پێشنیازەکانی سەبارەت بەو گۆڕانکارییانەی ئەنجامدراون لە سنوورە ئیدارییەکانی ناوچە جێ ناکۆکەکان پێشکەش بە پەرلەمانی عێراق بکات. لەسەر ئەو بنەمایە، جەلال تالەبانی، سەرۆکی کۆماری عێراقی پێشوو، لە ساڵی(٢٠١١) پڕۆژە یاسایەکی پێشکەش بە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق کرد بەمەستی هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەو یاساو بڕیارانەی کە ڕژێمی بەعس دەریکردبوون سەبارەت بە گۆڕانکارییەکانی سنوورە ئیدارییەکان. بەڵام ئەو پڕۆژە یاسایە لە پەرلەماندا قۆناغە دیاریکراوەکانی نەبڕیوە ولە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی ماوەتەوە.

بۆ ئەوەی سنووری ئیدارییەکانی کەرکوک بگێڕدرێنەوە، پێویستە هەر یەک لە پارێزگاکانی سەلاحەددین و دیالەو

سلێمانی دەست لە چەند ناوچەیەکی دیاریکراو هەڵبگرن‌و بیانلکێنن بە سنووری ئیداری کەرکوکەوە ئەوجۆرە گۆرانکارییە سنوورییانەش کارێکی ئاسان نین، بەڵکو پرۆسەی دوورو درێژو ئاڵۆزن‌و ئەگەری ئەوەیان هەیە کە هەرگیز بە تەواوی ئەنجام نەدرێن. بۆیە رەنگە پێویست بکات کە سنوورە ئیدارییەکانی ئێستای شاری کەرکوك وەك خۆیان بمێننەوە بۆ وەدەستهێنانی هەر بەرەو پێشەوەچوونێك بە ئاراستەی چارەسەکردنی پرسی کەرکوك.

ماددەی ٥٨ ی یاسای بەرێوەبردنی دەوڵەت بۆ قۆناغی گواستنەوە بە روونی ئاماژە بەوە دەکات کە دەبێت پرۆسەی ئاساییکردنەوە بە خێرایی ئەنجام بدرێت. بەڵام دوای تێپەربوونی زیاتر لە دە ساڵ لە واژوو کردنی ئەو یاسایەو گواستنەوەی بۆ ناو دەستووری عێراقی، دەکرێت بووترێت کە لە رووی عەمەلییەوە پرۆسەی ئاساییکردنەوە ئیدی تەواو بووە لەبەر ئەوەی ئەو برگانەی کە لە چوارچێوەی ئەو پرۆسەیەدا بە خێرایی ئەنجام نەدراون، ئیتر جێبەجێ ناکرێن. هەروەك شارەزایەکی ئەکادیمی کورد ئاشکرای کرد لەئەورۆدا هیچ نەخشەیەکی باشتر لە ماددەی ١٤٠ لە ئارادا نییە، بەڵام دەبێت پرسیار بکەین کام بەشی ماددەکە؟ بە بروای من ئاساییکردنەوە کۆتایی هاتووە[٣٣].

* (سەرژمێری‌و مافی بەشداربوون لە دەنگدان):

دەستووری عێراقی تەنیا دوو جار بە روونی ئاماژە بە وشەی سەرژمێری دەکات. یەکەمیان لە ماددەی(١٤٠) ئاماژەی پێ کراوە، کە تێیدا هاتووە کە ئەنجامدانی سەرژمێری بەشێکە لەو پرۆسەیەی کە بە ئەنجامدانی ریفراندۆم تەواو دەبێت. لە چوارچێوەی ئەو ماددەیەشدا مانگی تەمموزی ساڵی(٢٠٠٧) وەك دوا وادە بۆ ئەنجامدانی سەرژمێری دەستنیشان کرابوو. بەڵام ئەو دوا وادەیە، هەر وەك وادەی دیاریکراو بۆ ئەنجامدانی سەرژمێری گشتی لەسەر ئاستی عێراق کە ١٧ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٧ بوو، بەسەرچووو سەرژمێریش ئەنجام نەدرا[٣٤].

یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی ئەنجامنەدانی سەرژمێری دەگەرێتەوە بۆ کێشەی پرسیارکردن لەسەر ناسنامەی رەگەز(نەتەوە)ی بەشداربووان. دیارە ئەو جۆرە پرسیارانە دەکرێت ببنە هۆی سەرهەڵدانی ناکۆکی‌و ململانێ. ئەنجامدانی سەرژمێری لە کەرکوك دەبێتە مایەی دەستنیشانکردنی ئەوانەی مافی بەشداریکردنیان لە ریفراندۆم هەیە. بەڵام بۆ ئەوەی بە شێوازێکی دادپەروەرانە بەشداربووانی ریفراندۆم دەستنیشان بکرێن، پێویستە پێشوەخت چەند هەنگاوێك بنرێت. ئەوەش کارێکی زۆر قورسە چونکە بەشداربوون لە ریفراندۆم زۆر جار دەبەسترێتەوە بە مێژووی بەشداربووان، بە واتایەکی تر ئایا بەشداربوو خەڵکی کەرکوکە یان نا.

پێناسەکردنی ئەوەی کە کێ مافی بەشداربوونی هەیە لە ریفراندۆم بابەتێکە مشتومری زۆری لەلایەن پێکهاتەکانی شاری کەرکوکەوە لەسەرە. لە روانگەی پێکهاتەی تورکمانەوە زۆرینەی ئەوانەی کە لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ گەراونەتەوە نابێت مافی بەشداربوونیان لە ریفراندۆم پێبدرێت. رای زۆرینەو زاڵی نوێنەرانی پێکهاتەی تورکمان قبووڵی سەرژمێری دەکات وەکو بنەما بۆ دەستنیشانکردنی بەشداربووانی ریفراندۆم، بەڵام بەو مەرجەی کەوا سنووری ئێستای کەرکوك بێت. ئەوەش لایەنی کوردی بەرهەڵستی لێ دەکات. هەرچی پێکهاتەی عەرەبیشە رای کە هەر کەسێك هەڵگری بەڵگەنامەی فەرمی بێت‌و لە فەرمانگەکانی شاری کەرکوك دەرچووبێت، ئەوە بە خەڵکی کەرکوك ئەژمار دەکرێت‌و مافی بەشداربوونی هەر پرۆسەیەکی دەبێت کە چارەنووسی شارەکە دیاری دەکات. شایانی باسە لە پاش ساڵی(٢٠٠٣)، دەرکردن‌و گواستنەوەی بەڵگەنامە لە کەرکوك بۆ هەرکەسێك خەڵکی کەرکوك نەبێت بە فەرمی وەستێنراوە.

پێکهاتەی کوردیش روانگەیەکی یەکگرتووی نییە لەسەر ئەو بابەتە. بۆ نموونە یەکێك لە دیدەکان ئەوەیە کە هەرکەسێك بۆ ماوەی ٢٥ ساڵی رابردوو لە شاری کەرکوك ژیابێت‌و خاوەنی زەوی بێت دەکرێت مافی بەشداربوونی لە ریفراندۆمی هەبێت[٣٥].

بەڵام بەکارهێنانی سەرژمێری ساڵی(١٩٥٧) بە ناوچەکانی چەمچەماڵ‌و کەلارو کفری‌و دوزخورماتوو وەك بنەما بۆ دەستنیشانکردنی بەشداربووانی پرۆسەی ریفراندۆم، رای زۆرینەو زاڵە لە نێو پێکهاتەی کوردی[٣٦].

سەرژمێری ساڵی(١٩٥٧) بەلای تورکمان‌و کوردەوە مایەی رەزامەندییە لەبەر ئەوەی وەك درووسترین‌و باوەرپێکراوترین سەرژمێری لە قەڵەم دەدرێت کە تا ئێستا لە عێراقدا ئەنجامدرابێت. چەند ساڵێك دوای ئەنجامدانی ئەو سەرژمێرییە، گۆرینی دیموگرافیای شاری کەرکوك دەستی پێکرد، هەر بۆیە ئەو سەرژمێرییانەی کە دواتر ئەنجامدراون بە باوەرپێکراو دانانرێن. بەڵام پێکهاتەی عەرەبی بەتووندی بەکارهێنانی سەرژمێری ساڵی(١٩٥٧) وەك ئامرازێك بۆ دەستنیشانکردنی بەشداربووانی ریفراندۆم رەتدەکاتەوە لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەو سەرژمێرییە بۆ ئەو مەبەستە بەکاربهێندرێت، تەنیا رێژەیەکی کەمی ئەو عەرەبانەی لە کەرکوکن مافی بەشداربوونیان دەبێت.

سەرباری بوونی رای جیاواز لەسەر مافی بەشداربوون لە پرۆسەی سەرژمێری، پێکهاتەی تورکمان‌و عەرەب‌و هەندێك لە پێکهاتەکانی کوردیش بروایان وایە کە ئەو بابەتە پێویستە پێشوەختە رێککەوتنی لەسەر بکرێت. لێرەدا دەکرێ رەچاوەی ئەوە بکرێ کە ئەو " تەحەفوزاتانەی" لایەن‌و پێکهاتەکان وەکو هێڵی سوور دایاندەنێن پێویستە رەچاو بکرێن‌و هەڵوەستەیان لەسەر بکرێت. خۆ ئەوەی لایەنی عەرەبی پێشنیازی دەکات سەبارەت بە پێدانی مافی بەشداربوون لە دەنگدان بە هەرکەسێك هەڵگری بەڵگەنامەی فەرمی‌و دەرچووی دامودەزگاکانی کەرکوك بێت، لایەنی کوردی‌و تورکمانی دەست بەجێ رەتی دەکەنەوە چونکە ئەوە مانای پێدانی مافی بەشداربوونە لە هەڵبژاردن بە هاوردەکان. لەهەمان کاتدا پێشنیاری لایەنی کوردی لەسەر بەکارهێنانی سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) یاخود ٢٥ ساڵ لە نیشتەجێبوون یان خاوندارێتی زەوی ئەگەری زۆری هەیە بەتووندی لەلایەن عەرەبەکانەوە بەرهەڵستی لێبکرێت.

کەواتە لەوەدەچێ کە لێك نزیکبوونەوەی بۆچوونەکان سەبارەت بە ماف بەشداربوون ئەستەم بێ. هەر بۆیە دەشێت بوترێت کەوا هەر پرۆسەیەکی سیاسی سەبارەت بە ئەنجامدانی سەرژمێری ئەگەری زۆری هەیە بگاتە بنبەست. شایانی باسە کە لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی، ئەو ناوچە جێناکۆکانەی کە ریفراندۆمیان تێدا کراوە ماف بەشداربوون تێیاندا کێشەیەکی سەرەکی بووە. هەر بۆیە ئەو کێشەیە ئەگەری ئەوەی هەیە ببێتە هۆکاری دواخستنی پرۆسەی ریفراندۆم بۆ کاتێکی نادیار. بۆ نموونە ماف بەشداربوون لە ساڵی(٢٠١٤) لە وڵاتی قوبرس کێشەیەکی گەورە بوو، بەڵام سەرباری بوونی ناکۆکی و نارەزایی بەهێز بریاردرا کە ماف بەشداربوون بە هەموو قوبرسییەکان بدرێت. بێگومان رێپێدانی هەموو دانیشتووانی شاری کەرکوك نارەزایی لێدەکەوێتەوە بەتایبەت لەلایەن ئەوانەی کە پێیان وایە کە هەرکەسێك دانیشتوی شاری کەرکوك نەبێت و "خەڵکی رەسەنی" ئەو شارە نەبێت ماف بەشداربوونی پێبدرێت. سەرچاوەی کێشەی ماف بەشداربوون دەگەرێتەوە بۆ نیشتەجێبوونی ئەوانەی کە لە کاتی پرۆسەی تەعریب و ئەوانەی پاش ساڵی ٢٠٠٣ روویان کردە کەرکوك. بەڵام لە بەرامبەر ئەوەشدا، پێویستە ئەوە بوترێت کە پرۆسەی ریفراندۆم چارەنووسی هەموو دانیشتووانی شاری کەرکوك دیاری دەکات و زۆرینەی دانیشتووانی شاری کەرکوك خۆیان بە کەرکوکی دادەنێن و ناکرێت بەرژەوەندییەکانیان پشتگوێ بخرێن.

*** ( ریفراندۆم ):**

سەرچاوەی پەیدابوونی راو بۆچوون لەسەر ئەنجامدانی ریفراندۆم دەگەرێتەوە بۆ ئەو شێوازە ناروونەی کە ماددەی (١٤٠)ی پێ نووسراوەتەوە. ئەو ماددە دەستوورییە دەستنیشانی نەکردووە کێ ماف بەشداربوونی هەیە لە ریفراندۆم، وە ئاماژەی بەوە نەداوە کە ریفراندۆم لەسەر ئاستی چ یەکەیەکی ئیداری ئەنجام بدرێت، وە باس لەوە ناکات چ پرسیارێك دابرێژرێت لە ریفراندۆم، وە هەروەها ئەو لایەنەشی دەستنیشان نەکردووە کە دەبێ پرۆسەی ریفراندۆم بەرێوە ببات. هەر لەبەر ئەو هۆکارانەشە کە پێکهاتەکانی شاری کەرکوك لێکدانەوەو تەفسیری جیاوازییان هەیەو هەر لایەنێك بە گوێرەی بەرژەوەندی پێکهاتەکەی خۆی خوێندنەوە بۆ ئەو خاڵانەی سەرەوە دەکات.

سەبارەت بە پرسیاری ریفراندۆم، زۆر لە سیاسەتمەداران پشتگیریی لەوە دەکەن کە تەنیا یەك بژاردە بخرێتە بەردەم دەنگدەرانی پرۆسەی ریفراندۆم و ئەو بژاردەیەش پرسیار بێت لەسەر گەرانەوەی کەرکوك بۆ سەر هەرێمی کوردستان یان نا[٣٧].

بەڵام ئەو بۆچوونە بێگومان جێگای قبووڵی بەشێك لە پێکهاتەکانی تورکمان و عەرەب نییە لەبەر ئەوەی وەڵامدانەوە بە "نەخێر" بۆ پرسیاری یەك بژاردەیی مانای ئەوە دەگەیەنێت کە کەرکوك وەکو بەشێك لە عێراقی مەرکەزی بمێنێتەوە. پێکهاتە ناکوردییەکانیش ئەوەیان پێ قبوڵ نییەو دەیانەوێت دیدو روانگەی خۆیان سەبارەت بە داهاتووی شاری کەرکوك لە ریفراندۆمدا جێی بکرێتەوە. بەڵام سەرەرای بوونی روانگەی جیاواز لەسەر ئەو بابەتە، هەندێك لەلایەنە کوردییەکان رایان وابوو کە دەبێت حکومەتی هەرێمی کوردستان پێش بەرێوەچوونی هەر دەنگدانێك سەبارەت بە داهاتووی ناوچە دابراوەکان، بە ئەنجامدانی توێژینەوەیەك هەڵبستێت بەمەبەستی روونکردنەوەی چەند خاڵێك، وەکو رێژەی دانیشتووانی پێکهاتەی کوردی لەو ناوچانەو دەوڵەمەندی ئەو ناوچانە لە رووی سەرچاوەو سامانی سروشتی، دیاریکردنی نزیکی سنووری جوگرافی ئەو ناوچانە لە یەکتر[٣٨].

***( سنووری ئیداری دەنگدان ):**

سەبارەت بە سنووری ئیداری دەنگدان، کۆمەڵێك تێروانین پێشنیازکراون، لەوانە پێشنیازی ئەوەی کە ریفراندۆم لەسەر ئاستی پارێزگا ئەنجام بدرێت، بەڵام پاش گەرانەوەی سنووره ئیدارییەکانی کەرکوکی پێش رژێمی بەعس[٣٩]. زۆر جار پێشنیازی ئەنجامدانی ریفراندۆم لەسەر ئاستی قەزاو ناحییەکان پێشکەش کراوە، ئەوەش بەو بروایەی کە ئەنجامەکانی ریفراندۆم رەنگدانەوەی ویستی خەڵکی ناوچەکانی شاری کەرکوك دەبێت[٤٠].

بەڵام ئەنجامدانی ریفراندۆم لەسەر ئاستی یەکەی ئیداری بچووك، قەزاو ناحیە، ئەگەری زۆری هەیە کەوا ببێتە هۆی دروستبوونی ئاڵۆزی و لێکترازانی زیاتر. خۆ ئەگەر ئەنجامەکانی ریفراندۆم جیاواز بوو لە قەزایەکەوە بۆ قەزایەکی تر یان لە ناحیەیەکەوە بۆ ناحیەیەکی تر، ئەوە ئیتر دەبێت سنووری نوێ دابرێژرێتەوە. بۆیە، دەکرێت بوترێت کە ئەنجامدانی ریفراندۆم لەسەر ئاستی پارێزگاو بە سنووری ئیداری ئێستاوە گونجاوترین بژاردە بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، پەیرەوکردنی ئەو شێوازە پێویستی بە کۆدەنگی سیاسییە.

هەندێك لە نوێنەرە کوردەکان گرنگییەکی زۆریان داوە نەك تەنها بە گەیشتنە کۆدەنگی نێوان نوێنەرانی پێکهاتەکانی شاری کەرکوك سەبارەت بە بابەتی ریفراندۆم، بەڵکو بە تێکرای خاڵەکانی ماددەی ١٤٠یش، جگە لە بابەتی قەرەبووکردنەوەی دارایی. زێتر لەوەش، رۆڵی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لە گەیشتن بە هەر رێکەوتنێك یا کۆدەنگییەك بەزۆر گرنگ نەژمارکرا[٤١]. جگە لە هاوکاریکردن و هاندان و لێك نزیکردنەوەی بۆچوون و بەرژەوەندی لایەنەکان، کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، بەتایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان و ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، رۆڵی مەزن لە دانپێدانانی هەر رێککەوتنێك لە داهاتوودا دەبینن. کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق دەتوانێت ریفراندۆم لە کەرکوك بەرێوەببات. هەروەها نێردەی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ هاریکاریکردنی عێراق(یونامی) دەتوانێت لە رێی تیمی هاویکاریکردنی هەڵبژاردنەکان(EAT) یارمەتی تایبەت بە هەڵبژاردن پێشکەش بکات[٤٢].

سەبارەت بە پرۆسەی ریفراندۆم، چەند خاڵێك هەن کە هەر سێ لایەن لەسەریان کۆکن، وەك پێویستی گەیشتن بە رێککەوتن و تەرخانکردنی بری بودجەی پێویست

بۆ بەڕێوەبردنی ریفراندۆم، و دەرکردنی یاساو ڕێسای هەڵبژاردن لەلایەن پەرلەمانەوە. گەیشتن بە ڕێکەوتنێکی سیاسی دەستکەوتێکی مەزن و جوامێرانە دەبێت، ئەگەرچی لەوانەیە ڕێکەوتنەکان جەخت بکەنە سەر دۆخی کۆتایی پاش ریفراندۆم. کاتێك باس لە چارەسەری سیاسی بۆ دۆخی کەرکوك دەکرێت، پێویستە ئاماژە بە چارەسەرە پێشنیازکراوەکان سەبارەت بە دۆخی دوارۆژی ئەو شارە بکرێت. ئەو پێشنیازانەی(مێری)ش وەکو چارەسەر بۆ کێشەی سنوورو شێوازی ئیدارەکردنی شاری کەرکوك پێشکەشکراون. پوختەی پێشنیازەکان گەنگەشەی ئەوە دەکەن کە ئایا کەرکوك بخرێتە سەر سنووری کارگێری هەرێمی کوردستان یان نا، یاخود لەدوای ئەنجامدانی ریفراندۆم شێوازێکی بەڕێوەبردنی تایبەت بەو پارێزگایە ببەخشرێت یان نا.

سەبارەت بە چارەسەرە پێشنیازکراوەکان، لە خوارەوە شەش(٦) سیناریۆ سەبارەت بە چارەنووسی شاری کەرکوك دەستنیشان کراون. ڕەنگە ئەوانە لە ڕابردوودا باس کرابن، بەڵام تێگەیشتن و تێڕوانینی پێکهاتەکانی شاری کەرکوك سەبارەت بە هەریەکەیان زۆر گرنگە، بەتایبەتی لە دوای ئەو گۆڕانکارییە مەزنانەی لەدوای حوزەیرانی ساڵی(٢٠١٤) هاتنە ئاراوە، چونکە ئەو تێگەیشتنە ڕیخۆشکەر دەبێت بۆ دۆزینەوەی چارەسەی سیاسی بۆ ئەو شارە. ڕەنگە دیدو بۆچوونە جیاوازەکانی پێکهاتەکان لەمەڕ ئەو سیناریۆیانە دەرئەنجامی مەترسی و نیگەرانی ئەمنی و ئابووری و سیاسی بوو بێت لەو شارە. سیناریۆکان ئەوانەن:

١- کەرکوك وەك پارێزگایەکی ئاسایی لە دەرەوەی سنووری کارگێری هەرێمی کوردستان. لە چوارچێوەی ئەو سیناریۆیەدا کەرکوك وەك هەر پارێزگایەکی عێراق دەمێنێتەوەو حکومەتی ناوەندی لە بەغدا ئیدارەکردنی دەگرێتە ئەستۆ.

٢- کەرکوك بە سیستمێکی بەڕێوەبردنی تایبەت لەدەرەوەی سنووری هەرێمی کوردستان. لەم سیناریۆیەدا کەرکوك لە دەرەوەی سنووری کارگێری هەرێمی کوردستان دەبێت بەڵام دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی تایبەت بە خۆی دەبێت. لە ڕووی ئیدارییەوە دەسەڵاتەکان لە حکومەتی ناوەندییەوە شۆڕ دەکرێنەوە بۆ ئیدارەی کەرکوك، بەڵام لە ڕووی جوگرافییەوە ئەو شارە یان دەبێتە هەرێمێك یان پارێزگایەك بەڵام بە ئاستێکی کەمتر لە ژێر کاریگەری دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی هەریەك لە بەغداو هەرێمی کوردستان دەبێت[٤٣].

٣- هەرێمێکی سەربەخۆ.

لەم سیناریۆیەدا کەرکوك دەکرێتە هەرێمێك و دەسەڵات و مافەکانی هاوشێوەی هەر هەرێمێکی فیدرالی دەبێت لە عێراق.

٤- کەرکوك وەك پارێزگایەکی ئاسایی لە چوار چێوەی هەرێمی کوردستاندا. لەم سناریۆیەدا کەرکوك وەکو پارێزگایەکی هەرێمی کوردستان دادەنرێت و ئەو مافانەی دەدرێتێ کە بە پارێزگاکانی تری هەرێمی کوردستاندا دراوە. لەو حاڵەتەدا، سنووری جوگرافی و دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی ئەو شارە دەکەوێتە ژێر ڕکێفی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە.

٥- کەرکوك بە حاڵەتێکی بەڕێوەبردنی تایبەتەوە لە چوارچێوەی سنووری کارگێری هەرێمی کوردستان.

ئەو سیناریۆیە شاری کەرکوك دەخاتە نێو سنووری جوگرافی هەرێمی کوردستانەوە بەڵام بە سیستەمێکی بەڕێوەبردنی تایبەت بە خۆیەوەو جیاواز لەگەڵ پارێزگاکانی تری هەرێم کوردستان.

٦- حاڵەتی بەڕێوەبردنی کاتی سەربەخۆ.

بە گوێرەی ئەو سیناریۆیە کەرکوك بە قۆناغێکی کاتی تێدەپەڕێت و دەبێتە هەرێمێك لە دەرەوەی کۆنترۆڵی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ ماوەی پێنج تا دە ساڵ و شێوازێکی بەڕێوەبردنی تایبەتی بەخۆی پەیڕەودەکات. ئەو قۆناغە دەکرێت وەکو حاڵەتێکی تایبەتی کاتی وەسف بکرێت. دوای تەواوبوونی ئەو قۆناغە کاتیەو دروستبوون و پتەوبوونی متمانە لەنێوان پێکهاتەکانی شاری کەرکوك و هەروەها نێوان بەغداو هەرێمی کوردستان، ریفراندۆم ئەنجام دەدرێت بۆ بڕیاردان لەسەر ئەگەری لکاندنی سنووری جوگرافی شاری کەرکوك بە سنووری هەرێمی کوردستانەوە، چونکە بە گوێرەی ئەو سیناریۆیە شێوازی بەڕێوەبردن، تایبەت و جیاواز دەمێنێتەوە، جا لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستان بێت یاخود لە دەرەوەی. شایانی باسە حاڵەتی ئیدارەی کاتی زۆر جار وەکو میکانیزمێك بۆ یەکلاییکردنەوەی ململانێ دژوارو درێژخایەنەکان بەکارهێنراوە[٤٤].

شایانی باسە تێگەشتن و دیاریکردنی بژاردەی پەسەندکراوی لایەنە سەرەکییەکانی کەرکوك کارێکی زۆر گرنگە، بەڵام لەهەمان کاتدا دەبێت ئاماژە بەوە بکرێت کە گشتاندن بەسەر بۆچوونی پێکهاتەکان لەمەڕ ئەو بابەتە ئاڵوزە، کارێکی قورس و گرانە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت بە شێوازێکی فراوان و گشتی ڕوانگەی لایەنەکان دەستنیشان بکرێت.

دیاریکردنی ڕوانگەی لایەنی عەرەبی گرنگە لەبەر ئەو گۆڕانکارییانەی لە بارەی ئاسایشی ناوچەکەو شاری کەرکوك لە مانگی حوزەیرانی ساڵی (٢٠١٤)ەوە هاتنە ئاراوە، کە بەشی زۆری پارێزگاکە بە ناوەندی قەزای کەرکوکەوە کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی هێزەکانی پێشمەرگە. ئەو وەرچەرخانە گەورەیە نیگەرانی لایەنی عەرەبی لە کەرکوك لێکەوتەوە. سەرچاوەی ئەو نیگەرانییە دەگەڕێتەوە بۆ بەربڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی هێزەکانی پێشمەرگە لە ناوچەکەدا، لە کاتێکدا جووڵانەوەی ئەو هێزانە لە بنەڕەتدا بۆ پاراستنی سەقامگیری ئاسایشی بوون و بۆ وەستاندنی پێشڕەوییەکانی چەکدارانی داعش پێویست بوون. لەم بارەیەوە یەکێك لە نوێنەرانی پێکهاتەی عەرەب وتی "ئێمە قبوولی ئەو ڕاستییە دەکەین سەبارەت بە ئامادەبوونی هێزەکانی پێشمەرگە، بەڵام قبوڵمان نییە کە پێکهاتەی کوردی دەسەڵاتی دیفاکتۆ بۆ مەرامی سیاسی خۆی بقۆزێتەوە"[٤٥].

ئامادەبوونی فراوانی هێزە ئەمنییە کوردییەکان، بە تایبەتی هێزەکانی ئاسایش، مەترسی پێکهاتەی عەرەبی

لێکەوتۆتەوە[٤٦].

نوێنەرانی پێکهاتەی عەرەبی بڕوایان وایە کە حیزبە کوردییەکانی نێو حکومەتی هەرێمی کوردستان دەیانەوێت تەواوی دەسەڵاتی خۆیان بەسەر کەرکوکدا بسەپێنن. هەروەها عەرەب خۆیان وەکو بەشێك لە پرۆسەی بڕیاردان نابینن و لەوە نیگەرانن ببن بە کەمینە لە کەرکوکدا[٤٧].

لەوانەیە هەر لەبەر ئەو هۆکارانەوە بێت کە پێکهاتەی عەرەب دژی گۆڕانکارییە لە سنووری ئیدارییەکانی پارێزگای کەرکوك و دژی بەکارهێنانی سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧)ە بۆ دەستنیشانکردنی دەنگدەران. دیارە کە ئەو دوو ڕێ و شوێنە ڕێژەی دەنگدەرانی سەربە پێکهاتەی عەرەب بە ئاستێکی بەرچاو کەم دەکاتەوە.

دیدی پێکهاتەی عەرەب دژی لکاندنی کەرکوکە بە سنووری کارگێڕی ئێستای کوردستان. لە ڕوانگەی ئەوانەوە ئەو کارە دەبێتە هۆی پەراوێز خستنیان چونکە لەو حاڵەتەدا دەبنە کەمینە. زۆر جار نوێنەرانی پێکهاتەی عەرەبی کە دەیانەوێ بیسەلمێنن کە ئەوان بڕوایان بە ماددەی ١٤٠ و پرۆسەکانی چارەسەر نیە باس لە بایکۆتکردنی دەنگدانیان دەکەن لەسەر دەستووری عێراقی لە ساڵی(٢٠٠٥).

یەکێك لە سیاسەتمەدارانی پێکهاتەی عەرەب ڕایگەیاند کە "پێکهاتەی عەرەب لە کەرکوك ئەوەیان (کردنی کەرکوك بە بەشێك لە هەرێمی کوردستان) ڕەتدەکاتەوە و ئەو ڕەتکردنەوەیەش چەند هۆکارێکی هەیە. یەکەم، هەرێمی کوردستان لەسەر بنەمای نەتەوەیی بوونیاتراوە نەك جوگرافی لەبەر ئەوەی زۆرینەی دانیشتووانی کوردن. هەروەها یاسا و ڕێساکان لەو هەرێمەدا بە پێی کەلتوری کوردی دارێژراون، لەبەر ئەو هۆکارانە، بەبڕوای عەرەبەکان، بوون بەشێك لە هەرێمی کوردستان مانای سڕینەوەی مافەکانیان دەگەیەنێت[٤٨].

لەوانەیە کۆنترۆڵکردنی کەرکوك لەلایەن هێزە کوردییەکانەوە بە ڕوونی دیدی پێکهاتەی عەرەبی لەمەڕ چارەسەرەکان بۆ کێشەی کەرکوك دەرخستبێت. لە ڕابردوودا زۆرینەی لایەنە عەرەبەکان دەیانەوێت کەرکوك وەکو پارێزگایەك لە عێراق بمێنێتەوە و بەڕێوەبردنیشی لەلایەن حکومەتی ناوەندی بەغداوە بکرێت. بەشێکی تر لە پێکهاتەی عەرەبی کەرکوك ڕایان وابوو کە پێویستە پارێزگایەکە حاڵەتێکی تایبەتی هەبێت و بەشێوازێکی تایبەت بەڕێوەببرێت. ئەو دوو ڕوانگەیە کەرکوك لە دەرەوەی سنووری جوگرافی هەرێمی کوردستان دادەنێت. ئەوە ڕای پێکهاتەی عەرەب بوو لە کەرکوك هەتا پێش حوزەیرانی ساڵی(٢٠١٤)، بەڵام لێرەدا ئەوەی گرنگە بوترێت ئەوەیە کە بۆچوونەکانی پێکهاتەی عەرەبی توندتر بووە لەبەر زیادبوونی نیگەرانییەکانیان سەبارەت بە ئاسایشی پێکهاتەکەیان لە کەرکوك و هەروەها لەبەر گۆڕانکاری لە ئاستی متمانەی پێکهاتەکانی شاری کەرکوك بەیەکتر.

ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە ئێستا ئەوەیە کە بۆچوونی پێکهاتەی عەرەبی لە دوای ڕووداوەکانی حوزەیرانی ساڵی(٢٠١٢) گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. بەهۆی دروستبوونی بێ متمانەیی لەنێوان عەرەبی سووننە و حکومەتی بەغدا، کە شیعە مەزهەبەکان بەسەریدا زاڵن، زۆرینەی لایەنی عەرەبی دژی بیرۆکەی بەستنەوەی کەرکوکن بە حکومەتی ناوەندی بەغداوە لە ڕووی جوگرافی و کارگێڕییەوە. بەڵام ئەوە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئەوان پشتگیری لە چوونە پاڵ هەرێمی کوردستان دەکەن. ئەوان پێیان باشترە کە کەرکوك لە ڕووی جوگرافییەوە بکرێتە پارێزگایەك یان هەرێمێك، بەڵام دەسەڵات و نفوزی حکومەتی هەرێمی کوردستان یان حکومەتی ناوەندی عێراقی تێیدا لە کەمترین ئاستدا بێت. زۆرینەی پێکهاتەی عەرەب پێش حوزەیرانی پارساڵ بەتوندی دژی ئەو بۆچوونە دەوەستان. شایانی باسە کە زۆرینەی نوێنەرانی کۆمەڵگای عەرەبی ماددەی ١٤٠ و چەمکی پرۆسەی ڕیفراندۆم لە کەرکوك بە نادروست دادەنێن[٤٩].

کەچی یاسای دروستکردنی هەرێمەکان بە ڕێگەچارەی یاسایی و شەرعی دادەنێن. بەپێی یاسایەش، دەبێت سێیەکی ئەندامانی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك یاخود لە سەدا دەی(١٠٪) دەنگدەران دەنگ لەسەر ئەنجامدانی ڕیفراندۆم بدەن بەمەبەستی بە هەرێمکردنی پارێزگای کەرکوك[٥٠].

بەڵام ئەگەر هەر یەك لە حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی عێراقی زەمانەتی چەند گەرەنتیەك بکەن، ئەگەری ئەوە هەیە کە پێکهاتەی عەرەب ڕوانگەی بگۆڕێت بە شێوازێك دوور بێ لە هەڵوێستی ڕەتکردنەوەیی. سەبارەت بە مافی بەشداربوون لە دەنگدان، هەندێك لە نوێنەرانی پێکهاتەی عەرەب ڕایان وایە کە تەنیا ئەوانەی هەڵگری ناسنامەی دەرچوو لەلایەن دامودەزگاکانی کەرکوکن مافی دەنگدانیان لە ڕیفراندۆم هەبێت، ئەوەش لەکاتێکدایە کە پرۆسەی گواستنەوەی ناسنامە و چەند بەڵگەنامەیەکی تر لە بەڕێوەبەرایەتی ڕەگەزنامە و باری شارستانی کەرکوك بەفەرمی وەستێنراوە. بێگومان ئەو ڕایەش زۆرینەی ئەوانەی کە لەدوای ساڵی(٢٠٠٣) گەڕاونەتەوە بۆ کەرکوك لە دەنگدان بێبەش دەکات. هەرچی، بەڕای سیاسەتمدارێکی پێکهاتەی عەرەبییشە، ئەوانەی دوای(٢٠٠٣) هاتوونە بۆ کەرکوك و دەتوانن بیسەلمێنن کە خاڵکی ڕەسەنی کەرکوکن، دەتوانن بە شداری لە ڕیفراندۆم بکەن[٥١].

*(**ڕوانگەی پێکهاتەی تورکمان**):

دەشێت بوترێت کە لە نێو پێکهاتەی تورکمانیدا ڕوانگەیەکی یەکگرتوو سەبارەت بە کێشەی کەرکوك بەدی ناکرێت، ئەوەش هۆکارەکەی ئەوەیە کە لایەنی تورکمانی بەسەر پارتی سیاسی و بەرەی تایفیدا دابەش بوون. ڕوانگەی پێکهاتەی تورکمان دەکرێت بەسەر سێ(٣) بەشدا دابەش بکرێت:

١- ئەندامە تورکمانەکان لیستی(برایەتی کەرکوك).

٢- تورکمانە شیعە مەزهەبەکان، کە زۆرینەیان لایەنگری چەند پارتێکی سیاسی جیاوازن.

٣- بەرەی تورکمانی کە لە شەش پارت پێکهاتووە و زۆرینەیان سوننە مەزهەبن و پەیوەندی بەتینیان لەگەڵ ئەنقەرە هەیە.

هەریەك لەم گرووپانە بۆچوون و هەڵوێستی جیاوازیان هەیە. بۆ نموونە، ئەندامانی لیستی برایەتی کەرکوك رەنگە زیاتر پشتیوانی ئەو جۆرە چارەسەرییانە بکەن کە لەدەرئەنجامدا کەرکوك، جا بە حاڵەتێکی ئیداری بێت یان نا، دەخاتە نێو سنووری کارگێڕی هەرێمی کوردستان. هەرچی دوو گرووپەکەی تریشە، لەگەڵ ئەوەن کە کەرکوك جۆرێك لە حاڵەتی تایبەمەندی پێ ببەخشرێت، بەڵام لە دەرەوەی چوارچێوەی هەرێمی کوردستان. بەرەی تورکمانی عێراقی، کە لە رابردووەوە پشتگیری لە بەهەرێمبوونی پارێزگای کەرکوك دەکات، لە ئێستادا باس لە میکانیزمی ئەو پرۆسەیە دەکات کە پشتی بە ماددەی(١١٩) دەستووری عێراقی بەستووە. ئەو ماددەیەو ئەو یاسایەی کە لەژێر رۆشناییەکەی دەرچووە[٥٢].

رێگە بە پارێزگاکان دەدات هەرێم پێکبهێنن لە رێگای داواکاری سێیەکی ئەندامانی ئەنجومەنی ئەو پارێزگایە، یاخود لە رێی داواکاری دەیەکی دەنگدەران بۆ ئەنجامدانی ریفراندۆم[٥٣].

لەم بارەیەوە، نوێنەرێکی دیاری پێکهاتەی تورکمان رایگەیاند: ئێمە خۆشە ببینە شەریکی راستەقینە لەگەڵ کوردەکان.. سنووری کوردستان لە دەستوور پێناسە کراوە. ئێمە درك بەوە دەکەین بەڵام ئێمە کەرکوك وەك بەشێك لە هەرێمی کوردستان دانانێین. ئێمە دەمانەوێت کەرکوك بکرێتە هەرێمێکی فیدرالی سەربەخۆ[٥٤].

لەگەڵ ئەوەشدا، زۆران لە نوێنەری تورکمانەکان بەهەرێمبوونی کەرکوك وەکو چارەسەرێکی کاتی دادەنێن. هەر ئەو نوێنەرەی پێکهاتەی تورکمان کە لەسەرەوە ئاماژەی پێ کراوە وتی "ئێمە دەمانەوێ ئەوە (بەهەرێمبوونی کەرکوك) بۆ ماوەی هەشت ساڵ بێت، پاشان دەتوانین ریفراندۆم ئەنجام بدەین. ئینجا ئێمە ئەنجامی ریفراندۆم قبوڵ دەکەین[٥٥].

ئەوە چارەسەرێکە کە دەکرێت وەکو "حاڵەتێکی تایبەتی کاتی" لە قەڵەم بدرێت و لە روانگەی پێکهاتەی تورکمانییەوە وەکو میکانیزمی دروستبوونی متمانە ئەژمار دەکرێت. جێی ئاماژە پێکردنە کە نوێنەرانی پێکهاتەی تورکمانی نیگەرانییەکی زۆریان لێ بەدی دەکرێت سەبارەت بە مافە یاساییەکانیان و بابەتی نوێنەرایەتی کردنیان، ئەگەر کەرکوك بە هەرێمی کوردستانەوە لکێندرا. زۆر جار هەندێك لە سیاسەتمەدارە تورکمانەکان باسی زەمانات دەکەن لەکاتی لکاندنی کەرکوك بە هەرێمی کوردستانەوە: "ئێمە داوادەکەین کە کەرکوك حاڵەتێکی تایبەتی پێ ببەخشرێت، جا لە عێراق بێت یاخود لە هەرێمی کوردستانی عێراق. ئەگەر کەرکوك کرا بە بەشێك لە هەرێمی کوردستان، ژمارەی تورکمانەکان زیاد دەکات زیاد بوون لە ژمارەدا مانای زیاد بوونە لە نوێنەرایەتی کردن.. حاڵەتی تایبەت دەبێتە مایەی بەرزبوونەوەی ئاستی متمانە لەنێوان کوردەکان و عەرەبەکانیش[٥٦].

بۆچوونەکانی لایەنی تورکمانی لەسەر لکاندنی کەرکوك بە هەرێمی کوردستانەوە جەخت دەکەنە سەر گەرەنتی سیاسی و کەلتووری. ئەو گەرەنتیانەش پێدانی مافی پێشبرکێکردن بە پێکهاتە ناکوردییەکای کەرکوك لەسەر تێکرای پۆستەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەگرێتەوە، لەنێوانیشیان پۆستی جێگری سەرۆکی هەرێمی کوردستان و پۆستی جێگری سەرۆکی هەرێمی کوردستان.

هەروەها هەندێك لە نوێنەرانی پێکهاتەی تورکمانی ئاماژەیان بەوە دا کە دەبێت لە ئاڵای هەرێمی کوردستان و سیمبولە نیشتیمانییەکاندا ئاماژە بە پێکهاتە ناکوردییەکان بکرێت. پێویستە ئەو بنەمایانە لە دەستووری داهاتوی هەرێمی کوردستان جێگیر بکرێت وەك هەنگاوێك بۆ دروستبوونی متمانە. لە هەمان کاتدا، حکومەتی عێراق دەتوانێت شێوازی گەرەنتی تر پێشکەش بکات، وەکو رێگەپێدان بەوەی کە کەرکوك لەدوای ئەنجامدانی ریفراندۆم بکرێتە هەرێمێکی فیدرالی سەربەخۆ.

***(روانگەی پێکهاتەی کورد):**

لەسەرەتادا گرنگە تێبینی ئەوە بکرێت کە جیاوازییەکی بەرچاو لە بۆچوونی حکومەتی هەرێمی کوردستان و نوێنەرە کوردە لۆکاڵییەکانی کەرکوك هەیە. پارتە سیاسییە کوردییەکان هاوران لەسەر ئەوەی کە دەبێت کەرکوك بخرێتە سەر هەرێمی کوردستان، بەڵام هاورا نین لەسەر شێوازی بەڕێوەبردن و پرۆسەی لکاندنی کەرکوك بە هەرێمی کوردستانەوە. هەر بۆیە هەڵوێستێکی کوردی روون و یەکگرتوو سەبارەت بەچارەنووسی کەرکوك بەدی ناکرێت. سیاسەتمەدارێکی شارەزای کورد لە وەڵامدا بۆ ئەو پرسیارەی کە ئایا هەڵوێستێکی کوردی یەکگرتوو بەرامبەر بە کەرکوك دەبینرێت یان نا وتی: "بە بڕوای من کێشە لە رێکەوتنی خەڵکی کەرکوکدایە ئەوەك حیزبە سیاسییەکان.. ئێمە کێشەی هەردوو دەسەڵاتی جیاوازی سلێمانی و هەولێرمان هەیە و نامانەوێت کێشەیەکی دیکە زیاد بکەین[٥٧].

بەڵام لەسەر ئەرزی واقیعدا روانگەیەکی جیاواز لە کەرکوك سەری هەڵداوە. ئەوەی کە ئێستا روون و ئاشکرایە ئەوەیە کە زۆران لە نوێنەرانی پێکاتەی کوردیش دەیانەوێت کەرکوك حاڵەتێکی بەڕێوەبردنی تایبەتی بۆ فەراهەم بکرێت. رای ئەوانە وایە کە پێویستە کەرکوك لە رووی جوگرافییەوە سەر بە هەرێمی کوردستان بێت، بەڵام دەبێ دەسەڵاتی بەڕێوەبردن لەو شارە بە بەراوود لەگەڵ پارێزگاکانی تری هەرێمی کوردستان جیاواز بێت. ئەندامێکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان سەبارەت بە شێوازی بەڕێوەبردنی کەرکوك رایگەیاند "پێویستە کەرکوك حاڵەتێکی تایبەتی بەڕێوەبردنی پێ ببەخشرێت. تورکمانەکانیش پێویستە ئەوەندە مافیان پێبدرێت کەوا هەست بکەن بە یاسا پارێزراون[٥٨].

کەرکوکییەکان لە کەرکوك هەست بەبێ ئومێدی دەکەن لەمەر "کەمتەرخەمی" حکومەتی هەرێمی کوردستان بەرامبەر بە پارێزگاکەیان. هەربۆیە، رەنگە ئەوەش هۆکاری بەربڵاوبوونەوەی بیرۆکەی بەهەرێمبوونی پارێزگای کەرکوك بێت لە چەند قوژبنێکی کۆمەڵگای کوردی لە کەرکوك. شایانی باسە کە لە نێو پێکهاتەی کوردی تێگەیشتنێك هەیە بەوەی کە کورد دەبێت نەرمی بنوێنێ بۆ گەیشتن بە هەر چارەسەرێك بۆ داهاتووی شاری کەرکوك[٥٩].

ئەوەش مانای دانووستان لەگەڵ نوێنەرانی پێکهاتە ناکوردییەکان دەگەیەنێت سەبارەت بەرجەستەکردنی مافەکانیان و زامینکردنی بەشداریکردنی ڕاستەقینەی ئەمنی و سیاسیان.

سەرەڕای کەموکورتییەکانی ماددەی(١٤٠)ی دەستووری عێراقی، پێکهاتەی کوردی ئەو ماددەیە وەکو بنەما بۆ گەیشتن بە چارەسەر بۆ کەرکوك و ناوچە جێناکۆکەکان دادەنێت. لەسەر ئەو خاڵە سەرکردەیەکی سیاسی کورد ڕایگەیاند ئەگەر بمانەوێ کێشەکە لە بەغدا تاوتوێ بکەین، پێویستە لەسەر بنەمای ماددەی ١٤٠ بیکەین. ئێمە هیچ بژاردەیەکی ترمان نییە[٦٠].

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆچوونێك هەیە کە ڕای وایە بۆ ئەوەی هەر بەرەوپێشچوونێك بە ئاراستەی چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك ئەنجام بدرێت، پێویستە ئەو هەنگاوانەی کە لە ماددەی ١٤٠ دا هاتوون پێناسە بکرێن. ئەوەش لەبەر ئەوەی بۆچوون و تێڕوانینی جیاواز هەن سەبارەت بە چۆنیەتی جێبەجێکردنی بڕگەکانی ئەو ماددەیە. بۆ نموونە شێوازی جێبەجێکردنی ئاساییکردنەوە، یان چۆنییەتی ئەنجامدانی سەرژمێری، یان ئایا ڕیفراندۆم ئەنجام بدرێت یان نا، بابەتگەلێکن کە تێڕوانینی جیاوازیان لەسەرە.

پێکهاتەکانی شاری کەرکوك، مانەوەی پارێزگاکەیان وەکو ناوچەیەکی هەمیشە جیناکۆك قبووڵ نییە، وە هەڵواسینی باری ئێستای ئەو شارە بەچارەسەرییەکی شیاو نازانن. ئەوان بە گشتی کۆکن لەسەر ئەوەی کە پێویستە پارێزگای کەرکوك سیستەمێکی بەڕێوەبردنی تایبەت بە خۆی بۆ دابین بکرێ، جا لە چوارچێوەی سنووری کارگێڕی هەرێمی کوردستان بێت لە دەرەوەی. دیارە کە چوارچێوەی سنوورە کارگێڕیەکە مایەی بۆچوون و تێڕوانینی جیاوازە، بەڵام سەرجەم پێکهاتەکان بە پێویستی دەزان ئەو پرسە بەرەزامەندی سەرجەم لایەنەکان یەکلایی بکرێتەوە. پێویستە هەردوو حکومەتی عێراق و هەرێمی کوردستان ماف هەڵبژاردن لەنێوان ئیدارەی هەرێم و بەغدا بدەنە دەست دانیشتووانی ئەو شارە.

ئاشکرایە کە بارودۆخی ئەمنی کەرکوك گۆڕاوە، بەهەمان شێوە بیربۆچوونی کاراکتەرە ناوخۆییەکانیش گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. ئەو گۆڕانکارییانە گرنگن چونکە هەر چارەسەرییەك بۆ یەکلاییکردنەوەی پرسی ئەو پارێزگایە، پێویستە لە نێو کارەکتەرە ناوخۆییەکانی کەرکوك هەڵقوڵێت. لە هەمان کاتدا پێویستە ئەو کارەکتەرانە ئامادەیی خۆیان بۆ گەیشتن بە سازانی سیاسی و هێنانەکایەی چارەسەرێکی ئاشتیانە لە ڕێگەی دانوستاندن ودیالۆگ نیشان بدەن.

دوای ئەنجامدانی ئەو توێژینەوەیە، ئەوەی بە ڕوونی بۆ ئینستیتیوتی(مێری) دەرکەوتووە ئەوەیە کە کارەکتەرە سیاسییە لۆکاڵییەکانی شاری کەرکوك ئەو دۆخەی ئێستای شارەکەیان، وەکو ناوچەیەکی جێناکۆك، بە چارەسەر دانانێن، بەڵکو لە ئێستادا ڕوانگەیەکی گشتی سەری هەڵداوە بەوەی پێویستە ئەو پرسە کەنگەشە بکرێت و چارەسەرێکی سیاسی بۆ بدۆزرێتەوە. سەرەڕای هەبوونی ڕاو بۆچوونی جیاواز دەربارەی جۆری چارەسەرییەکان، ئامادەیی بەدی دەکرێت بۆ دووبارە گفتوگۆکردن لەسەر ئەگەرەکانی داهاتووی کەرکوك. هەرچەندە بارودۆخی شڵەژاوی ئاسایشی لەسەرتاپای عێراق پشێوی دروستکردووە، بەڵام ئەو بارودۆخە دەرفەتێکی بۆ خەڵکی کەرکوك دروستکردووە بۆ دووبارە هەڵسەنگاندنەوەو چاوپێخشاندنەوەی داهاتووی پارێزگاکە. واقیعی ئێستا وادەخوازێت کە چارەسەرە پراگماتیکی و واقیعبینەکان دەستینیشان بکرێن. وە پێویستە ئەو چارەسەرانە گشتگیر بن و دەرئەنجامی شیکردنەوەی ڕەهەندە سیاسی و ئابوورییەکانی پەیوەست بە پێکهاتەکانی شاری کەرکوك بێت و لەسەر بنەمای سازان و بەشداری پێکردنی هەموو لایەنەکان بێت.

بۆ بەدیهێنانی هەر بەرەوپێشچوونێك لەمەڕ پرسی کەرکوك، پێویستە چوارچێوەیەکی نوێ دەستنیشان بکرێت بە شێوازێك کەوا گەنگەشەو شیکردنەوەی پرسە ئاڵۆزەکانی وەك سنووری جوگراف و پرسیاری ڕیفراندۆم و تۆماری دەنگدەران سەرژمێری بکات. ئەگەر چوارچێوەیەکی لەم چەشنە لە کەرکوك سەرچاوە بگرێت، ئەوا شەرعیەت وەردەگرێت و هاوکات دەبێتە هۆی گوشار خستنەسەر حکومەتی عێراق و حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ زیندووکردنەوەی ئەو پرۆسەیەی کە لە ئێستادا گەیشتووەتە بنبەست. دەکرێت بوترێت کە هەرچەندە ماددەی ١٤٠ ناکۆکی لەسەرە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی قۆناغەکانی ئەو ماددەیە جۆرێك لە ڕەزامەندی گشتی لەسەرە. بۆ ڕەخساندنی زەمینە بۆ ئەنجامدانی ڕیفراندۆم و دیاری کردنی چارەنووسی ئەو پارێزگایە، پێویستە چەندین هەنگاو بنرێت. پێویستە سەرکردە سیاسییەکان لەسەر ئاستی عێراق بە گفتوگۆ هەوڵدەن بە پێی هێڵێکی زەمەنی هەنگاوە عەمەلییەکانی پێش و پاش پرۆسەی ڕیفراندۆم ڕێکبکەون. تەنیا بەو جۆرە ڕێکەوتنە چارەسەری سیاسی سەرکەوتوو دێتە ئاراوە. دیارە کە گەرانەوەی جەختی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بۆ سەر عێراق و ئەگەری دروستبوونی نیەت و ئیرادەی سیاسی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، دەرفەتی زێڕینیان ڕەخساندووە بۆ گەیشتن بەو جۆرە ڕێکەوتنانە.

چوارچێوەی چارەسەرییەکان و ڕاسپاردەکان

١- کاتوساتی ئەنجامدانی ڕیفراندۆم

پێویستە ڕیفراندۆم لە مەودای سێ(٣) ساڵی داهاتوودا ئەنجام بدرێت و کاتەکەی دەستنیشان بکرێت. گرنگە کە پرۆسەکە لەگەڵ هەڵبژادرنی گشتی ئەنجومەنی نوێنەران(پەرلەمان)ی عێراقی ساڵی(٢٠١٨) تێکەڵ نەکرێت، بۆیە وا باشترە کە بەر لە ٣١ی ئاداری(٢٠١٨) ئەنجام بدرێت.

أ- پێویستە هەتاکو ناوەراستی ساڵی(٢٠١٦) حکومەتی عێراقی و حکومەتی هەرێمی کوردستان بەراوێژکردن لەگەڵ لایەنە لۆکاڵییەکانی کەرکوك، بگەنە ڕێکەوتنێکی سیاسی، بە جۆرێك کە ڕێخۆشکەر بێت بۆ گەیشتن بە چارەسەرو ئەنجامدانی ڕیفراندۆم.

ب- لە مەودای سێ(٣) ساڵی داهاتوو، سەبارەت بە شێوازی بەڕێوەبردنی شاری کەرکوك، تەنیا بژاردەی دوو

رێگە لە ئارادایە، کە گرنگە لە سەرەتاوە بڕیاریان لەسەر بدرێت.

" بەردەوامبوونی حاڵەتی ئێستا، و مانەوە وەکو ناوچەیەکی جیناکۆك.

" حاڵەتێکی ئیداری سەربەخۆ بە شێوەیەکی کاتی کە تێیدا حکومەتی خۆجێی کەرکوك ئەودەسەڵاتانەی هەبێت کە پێویستیێتی بۆ خۆبەڕێوەبردن.

ئینستیتیوتی مێری:- پێی وایە کە بژاردەی(ا) شیاوترە، لەبەرئەوەی لەگەڵ بارودۆخی کەرکوكو عێراق دەگونجێ. هەروەها ئینستیتوتی مێری هانی نوێنەرانی کەرکوك دەدات لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بۆ پەلەکردن لە داڕێژتنی یاسایەکی تایبەت بە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك کە تەنیا بۆ یەك خول کاری پێ بکرێت.

ج- پێویستە لە ماوەی ئەو سێ(٣) ساڵەدا هەنگاوەکانی دروستبوونی متمانە(کە لە بەشەکانی خوارتردا ئاماژەیان پێکراوە) پیادە بکرێن، وباری ئاسایشی ئەو شارە ئاسایی بکرێتەوە وە یان بەلایەنی کەمەوە جێگیر بکرێتەوە، و هەروەها خاڵە ناروونەکانی ماددەی ١٤٠ روون بکرێنەوە، بەتایبەتی مافی دەنگدانو سەرژمێریو پرسیاری ریفراندۆم.

ئینستیتیوتی مێری پێی وایە کە، ئەگەر ریفراندۆم لە مەودای ئەو سێ(٣) ساڵەدا ئەنجام نەدرێت ئەوا ئەگەری زۆر هەیە کە حاڵەتی ئێستای ئەو شارە(وەکو ناوچەیەکی جێناکۆك) وەك خۆی بمێنێتەوە. بۆچوونێك هەیە کە پێی وایە سەپاندنی حاڵەتی دیفاکتۆ(ئەمری واقیع) دەبێتە مایەی خاوەندارێتی ئەو شارە، بەڵام لە راستیدا لەوانەیە ببێتە هۆی بڵاوبوونەوەی ناسەقامگیری لەو پارێزگایەو ئاڵەباری پەیوەندییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستانو حکومەتی ناوەندی عێراق. مەسەلەی کەرکوك دەبێت بەئاشتیانەو لە رێی پرۆسەیەکی سیاسییەوە لەو ماوەیەدا چارەسەربکرێت، ئەگەر هەتا(٢٠١٨) بەرەپێشچوونێکی بەرچاو بەدی نەکرا، ئەگەری سەرکەوتنی چارەسەری سیاسی بۆ پرسی کەرکوك زۆر کەم دەبێتەوە.

٢- گەڕانەوەی سنووری کارگێری(ئیداری)و ماف بەشداریکردنو سەرژمێری

پێویستە مەسەلەی سەرژمێریو مافی بەشداریکردن لە ریفراندۆمو سنووری جوگرافی ریفراندۆم(لەسەر ئاستی پارێزگا یان یەکەی ئیداری بچووکتر) روون بکرێنەوە.

ا پێویستە رێکەوتنێکی سیاسی لە چوارچێوەی ماددەی ١٤٠ لەسەر گەڕانەوەی ناوچەکانی چەمچەماڵو کەلارو کفریو دوزخورماتوو بۆ سەر سنووری ئیدارەی کەرکوك بکرێت.

ئینستیتوتی مێری پێی وایە کە، گەڕانەوە بۆ سنووری ئیداری کەرکوکی پێش هاتنی رژێمی بەعس، کارێکی ئەستەمە، وە دووبارە داڕێژتنەوەی سنوورکانی کۆمەڵێك ناوچەی جێناکۆك کارێکی واقیعی نیە لەبەر کۆمەڵێك هۆکار. وە گۆڕانکاری لە سنووری ئیداری بەمەبەستی سیاسی تەنیا پەیوەست نیە بە پارێزگای کەرکوك، بەڵکو کۆمەڵێك پارێزگای تریش دەگرێتەوە.

ب - دەبێت پێش کاتی پێشنیازکراو بۆ ئەنجامدانی ریفراندۆم بابەتی ماف بەشداربوون لە ریفراندۆم یەکلایی بکرێتەوە، ئەویش لە رێگای رێکەوتنی سیاسییەوە.

ئینستیتیوتی مێری پێی وایە کە پێویستە هەموو دانیشتووانی شاری کەرکوك مافی دەنگدانیان هەبێ، جگە لە ئاوارەکانو هاوردانەی قەرەبووکردنەوەی داراییان وەرگرتووەو هەروەها ئەو هاوردانەی کەوا چاوەڕوانی قەرەبووکردنەوەی داراییین. زۆرینەی سیاسەتمەدارانی ئەو پێشنیازەیان پێ پەسندە، بەڵام ئەو بابەتە پێویستی بە رێکەوتنەوە بەبێ رێکەوتنیش ئەستەمە ریفراندۆم ئەنجام بدرێت.

ج - پێویستە لیستی بەشدار بووانی ریفراندۆم لە ساڵی(٢٠١٦) دا ئامادەبکرێت.

د - بابەتی سەرژمێری پێویستی بە رێکەوتنی سیاسییە. بەگوێرەی ماددەی ١٤٠ی دەستووری عێراقی، بۆ ئەوەی ریفراندۆم بکرێت، پێویستە سەرژمێری ئەنجام بدرێت. ئەگەر لایەنەکان نەگەیشتنە رێکەوتن لە بارەیەوە دەکرێ لە رێگای رێکەوتنێکی سیاسیو یاساییەوە بابەتی سەرژمێری هەڵپەسێردرێت.

٣- پرۆسەو پرسیاری ریفراندۆم

دوای ماوەی ئاماژە پێکراو(٣ساڵ)و پەیرەوکردنی بەندەکانی نەخشەرێگاکە، پێویستە:

١- ریفراندۆم ئەنجام بدرێتو شێوازەکەشی وەڵامدانەوە بێت بە "بەڵێ" یان "نەخێر"و وەڵامی زۆرینەی رەها وەربگیرێت. بەم شێوەش ئەنجامی ئەو ریفراندۆمە دەبێتە هۆی دیاریکردنی چارەنووسی هەمیشەیی کەرکوك.

پێشنیازی مێری ئەوەیە کە ئەو پرسیارەی خوارەوە وەکو بنەما لە کاتی ئەنجامدانی هەر ریفراندۆمێك لە داهاتوودا بەکار بهێنرێت: ئایا کەرکوك بخرێتە سەر هەرێمی کوردستانی عێراقی؟.

ب- پێویستە لایەنی نێودەوڵەتی پەیوندیدار پرۆسەی ریفراندۆم بکات، وبە دانپێدانانی ئەو لایەنە نێودەوڵەتیەش پرۆسەکە پەسەند بکرێت هەموو لایەك پابەندی جێبەجێ کردنی ئەنجامەکەی بن.

ج- پێویستە رێکەوتن لەسەر دەستنیشانکردنی ئەو لایەنە فەرمییە بکرێت کە پرۆسەی سەرژمێریو ریفراندۆم بەرێوەدەبات. شایەنی وەبیرهێنانەوەیە کە دەستووری عێراقی لایەنی جێبەجێکاری دەستنیشان نەکردووە کە ئەنجامدانی پرۆسەی سەرژمێریو ریفراندۆم دەگرێتە ئەستۆ. بۆ ئەو مەبەستەش و بەراوێژ لەگەڵ لایەنە نێودەوڵەتییەکان، وەك نێردەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ هاریکاریکردنی عێراق(UNAMI)، دەکرێت کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژادنەکانی عێراق بەو کارە رابسپێردرێت.

هـ - ریفراندۆم لەسەر ئاستی پارێزگاو لە چوارچێوەی سنووری ئیداری ئێستاکەی بکرێت. ئەنجامدانی ریفراندۆم لە تێکرای ناوچە جێناکۆکەکان لەسەر ئاستی بچوکتر(قەزاو ناحیە) پێشتر لەلایەن کۆمەڵێك سیاسەتمەدار پێشنیاز کراوە، بەڵام بەلای ئینسیتوتی میرییەوە دەکرێت کەرکوك وەك

حاڵەتێکی تایبەت مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. لە ناوچەکانی دیکە دەشێت شێوازی تری ریفراندۆم پیادە بکرێت.

٤- قۆناغی پێش و دوای ریفراندۆم

بەدرێژایی ئەو ماوەیەی پێش ئەنجامدانی ریفراندۆم، پێویست پرۆسەیەکی بەردەوام بۆ جێگیرکردنەوەی باری ئاسایشی هەبێت و پێویستە دەسەڵاتی ئیداری پێویست لە بەغداوە شۆڕبکرێتەوە بۆ ناو کەرکوك.

ا - کەرکوك تایبەتمەندێتی خۆی هەیەو پێویستە بەغداو هەولێر رێز لەوە بگرن و پشتگیری جێبەجێکردنی هەر دەرەنجامێك بکەن کە لە ریفراندۆمی کۆتایی دەردەچێت. پێویستە حکومەتی ناوەندی ئەو دەسەڵاتانە ببەخشێتە حکومەتی خۆجێی کەرکوك کە بۆ راپەڕاندن و جێبەجێکردنی کارەکانی پێویستەتی.

ب- لەخۆگرتنی روانگەیەکی روون سەبارەت بە دۆخی پاش ئەنجامدانی ریفراندۆم دەکەوێتە ئەستۆی حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی فیدراڵەوە. هەریەك لەودوو حکومەتانە دەتوانێت لە رێگای پێدانی گەرەنتییەوە سەرنجی کەرکوکییەکان بۆخۆی رابکێشێ. بۆ نموونە دەکرێت حکومەتی ناوەندی کۆمەڵێك گەرەنتی بدات وەکو دەرفەتدان بەوەی ئەگەر دەنگدەران مانەوەی کەرکوکیان لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان هەڵبژارد ئەوا کەرکوك بکرێتە هەرێمێکی سەر بەخۆ. بە هەمان شێوە، دەکرێت حکومەتی هەرێمی کوردستان گەرەنتی ئەوە بدات کە حاڵەتێکی ئیداری تایبەت ببەخشێتە پارێزگای کەرکوك ئەگەر دەنگدەران لکاندنەوەی کەرکوکیان بە هەرێمی کوردستان هەڵبژارد. دەبێ ئەو جۆرە گەرەنتیانەش پێش ریفراندۆم بە روون ئاشکرایی ئاماژەیان پێ بکرێت. لەم نێوەندەدا، کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دەتوانێ رۆڵێکی کاریگەر ببینێت لە رێ گوشار خستنەسەر لایەنەکان بۆ جێبەجێکردنی ئەو گەرەنتیانە.

٥- بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان

ا- پەیرەوکردنی پرۆژەیەکی یەکگرتوو بۆ چارەسەرکردنی پرسی کەرکوك.

پێویستە حکومەتی هەرێمی کوردستان رۆڵێکی بنیاتنەرانە بگێرێت لە گەیشتن بە چارەسەری کۆتایی بۆ دۆخی کەرکوك. پێویستە گشت پارتە سیاسییە سەرەکییەکان لە کەرکوك روانگەی هاوبەش هەماهەنگی تەواویان هەبێت لە بوارەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری (وەکو جێبەجێکردنی پرۆژەی ستراتیژی و وەبەرهێنان).

ب- پێویستە حکومەتی هەرێمی کوردستان هەوڵی جددی بدات و هەماهەنگی تەواوی هەبێت بۆ بوونیاتنانی متمانە لەنێوان پێکهاتەکانی کەرکوك. لاوازبوونی متمانە بەرامبەر حکومەتی هەرێمی کوردستان کۆسپێکی سەرەکییە لەبەردەم ئاساییکردنەوەی باردۆخی سیاسی و ئەمنی لە کەرکوك. بۆ چارەسەرکردنی ئەو پرسە، پێویستە گەرەنتی دەستووری بدرێتە گشت پێکهاتەکانی کەرکوك، لەنێوانیاندا دابینکردنی ژمارەیەك کورسی پەرلەمان و پاراستنی مافە کەلتووری و پەروەدەییەکان. بۆ نموونە، حکومەتی هەرێمی کوردستان، دەتوانێ دەرفەت بۆ کێبڕکێکردن لەسەر تەواوی پۆستە پیشەییەکان لە هەرێمی کوردستان برەخسێنێت، و دەتوانێ گەرەنتی ئەوە بدات کە پۆستی جێگری سەرۆکی هەرێم یان جێگری سەرۆك وەزیرانی هەرێم بدرێتە نوێنەرانی پێکهاتە غەیرە کوردەکانی کەرکوك. دەکرێ پۆستی هاوشێوەی تریش بۆ سەرجەم پێکهاتەکان زامن بکرێت. پێویستە پێدانی ئەو پۆستانەش لە دەستووری حکومەتی هەرێم جێگیر بکرێت، تەنانەت پێویستە لە ئاڵای هەرێمی کوردستان و سیمبوڵەکانی دیکەشدا ئاماژە بەو پێکهاتانە بکرێت.

ج- زامنکردنی بەشداربوونی هەموو پێکهاتەکان لە پۆستە باڵاکانی هێزی پۆلیس. کەرکوك پێویستی بەوەیە کە پارێزگاری لێ بکرێت لەلایەن هێزێکی پۆلیسەوە کە پێکهاتە مرۆییەکەی رەنگدانەوەی پێکهاتەکانی پارێزگاکە بێ. دەبێ پۆستە باڵاکانی ناو ئەو دامەزراوەیە ئەمنییەش بۆ هەموو لایەنەکان کراوە بێت. لە ئێستادا دامەزراندن لەو پۆستانە دادوەرانە نیەو رەنگدانەوەی فرەیی خەڵکی کەرکوکی نیە. فەراهەمکردنی دابەشکردنی ئەو پۆستە باڵایانە بۆ تەواوی پێکهاتەکان دەبێتە مایەی بەرزبوونەوەی ئاستی متمانە بە هێزی پۆلیس و کەمبوونەوەی ترس و گرژی نێو پێکهاتەکان.

٦- بۆ حکومەتی عێراقی فیدراڵ

ا - بەفەرمیکردنی باری ئاسایشی کەرکوك.

بارودۆخی ئاسایشی ئێستای کەرکوك حاڵەتێکی دیفاکتۆیەو دەرئەنجامی جێگۆرکێی هێزەکانی بەرگرییە بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەو ناوچەیە لە دوای ١٠ی حوزەیرانی ساڵی(٢٠١٤). بۆ سەقامگیرکردنەوەی پەیوەندی لەنێوان بەغداو هەولێر، دەبێت بارودۆخی ئاسایشی کەرکوك بە گوێرەی واقیعی ئێستا رێکەوتنی فەرمی لەسەر بکرێت. ئەوەش پەیوەستە بە رێکەوتنێکی ئاسایشی فەرمی نێوان بەغداو هەولێر لەمەر بەردەوامێتی هێزەکانی پێشمەرگە لە پارێزگای کەرکوك.

ب - تەرخانکردنی دارایی بۆ خێراکردنی پرۆسەی چارەسەرکردنی کێشەی خاوەندارێتی زەویوزارو قەرەبووکردنەوە. پێویستە بوودجەی پترۆدۆلاری کەرکوك زیاد بکرێت (هەروەك پێشنیازکراوە لە یاسای ژمارە ١٩ی ساڵی(٢٠١٣)، کە دووەمین هەموارکردنەوەی یاسای ژمارە ٢١ی ساڵی ٢٠٠٨)ە، ئەوەش بۆ خاتری دابینکردنی تەمویلی پێویست بۆ خێراکردنی پرۆسەی چارەسەرکردنی کێشەی موڵکایەتی زەویوزار(النزاعات الملكية). ناکۆکییەکانی خاوەندارێتی زەویوزار بە چارەسەر نەکراوەیی ماونەتەوە، چونکە جێنشینانی ئێستا داوای قەرەبووکردنەوە دەکەن بۆ هەوڵەکانی چەندین ساڵی ئەرك و ماندووبوون و وەبەرهێنان. لە هەمان کاتدا خاوەنە رەسەنەکانیش داوای گەراندنەوەی موڵکەکانیان دەکەنەوە. بۆیە، ئەگەر جێنشینان قەرەبوو بکرێنەوە، کێشەکە چارەسەر دەبێت و گەراندنەوەی خاوەندارێتی فەرمی دوا هەنگاو دەبێت کە دەمێنێتەوە بۆ جێبەجێکردن.

٧- کارکتەرە ناوخۆییەکان

ا - یەکگرتنەوەو کاراکردنی هێزە ئاسایشییەکان لە کەرکوك.

پێویستە هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ یەکبخرێنەوە. هێزەکانی ئاسایشی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئامادەبوونی مەیدانیان لە کەرکوك هەیەو تا رادەیەك کێشەی هەماهەنگیان لەنێوانیاندا هەیە. ئەوەش، دروستبوونی بۆشایی ئاسایشی لە شارەکە زیاتر دەکات. هەرچەندە ئەو دوو هێزە هێشتا لە هەرێمی کوردستانی عێراق یەکیان نەگرتۆتەوە، یەکگرتنەوەیان لە کەرکوك دەبێتە مایەی نیشاندانی نموونەیەکی باش بۆ بەشەکانی تری هەرێمی کوردستان. لەهەمان کاتدا پێویستە هێزەکانی ئاسایش پێکهاتەکانی تریش لەخۆ بگرێت و تایبەت نەبێت بەیەك نەتەوە.

جگە لە هێزەکانی ئاسایش، چەندین دەزگای ئەمنی تر لە کەرکوك کاردەکەن. ئەوەی پێویستە جەخت و بایەخی پێ بدرێت ئاستی کاریگەریی هێزە ئەمنییەکانە نەك ژمارەیان. دەبێ هەڵئاوسانی هێزە ئەمنییەکان لە پارێزگای کەرکوك کەمبکرێتەوە، بەڵام کاریگەرییان لە رێگای هەماهەنگی و هاوکاری زیاتر زیاد بکرێت. خۆ دیسانەوە پێکەوە هەبوونی چەندین هێزی ئەمنی کە ئاستی پەیوەندیی و هەماهەنگی نێوانیان نزم بێ، دەبێتە هۆی زیادکردنی بۆشایی ئەمنی.

ب - سنووردارکردنی بەدەستهێنانی چەك لەنێو شاری کەرکوك.

یەکێك لە کێشە گەورەکان لە کەرکوك بریتییە لە زۆریی و ئاسانی پەیداکردنی چەك. پێویستە یاساو رێنمایی توندتر بۆ بازرگانی کردن بە چەکی بچووك دابرێژدرێت. بەدەستهێنان و دەستکەوتنی چەك بەئاسانی، فاکتەرێکی سەرەکییە بۆ تێکدانی سەقامگیریی لە کەرکوك. سنووردارکردنی فرۆشتنی چەك بەشێوەیەکی ئاشکرا دەبێتە هۆی کارئاسانیکردن بۆ پاراستن و چاودێریکردنی دۆخی ئەمنی شارەکە.

ج - یەکسانکردنی دەرفەت بۆ بەدەستهێنانی پۆستی کارگێری.

تا ئێستا دامەزراندن لە سەر ئاستی کارمەندی حکومی و پۆستە گرنگە سەرکردەییەکان لەسەر بنەمای نەتەوەو ئینتیمای سیاسی بووە. پێویستە ئەو دیاردەیە کۆتایی پێ بهێندرێت. دەبێت لێهاتوویی و ئەزموون و کارامەیی دەستنیشانکردنی ئەرك بە پێی وەسفی وەزیفی لەبەرچاو بگیردرێن بۆ دامەزراندن. پێویستە حکومەتی ناوخۆ(لۆکاڵی) دەرفەتی یەکسان لە پرکردنەوەی پۆستە سیاسییەکان بۆ گشت لایەك دابین بکات.

د - بەشدارپێکردنی کۆمەڵگای مەدەنی لە پرۆسەی دارژتنی سیاسات و دروستکردنی بریار.

ئینستیتیوتی مێری هانی کۆمەڵگای مەدەنی لە ناوەوەو دەرەوەی شاری کەرکوك دەدات بۆ پاڵپشتی کردن و پێشکەشکردنی راوێژ بە بریاردەران، هەروەها لە چاودێریکردنی رەوتی جێبەجێکردنی رێکەوتنەکان. سەرەرای ئەوەش دەبێت کۆمەڵگای مەدەنی بە بەرپرسیارانەوە رەفتار لەگەڵ ئەو پرسە بکات و هەوڵی جیدی بدات بۆ دۆزینەوەی چارەسەرو لابردنی ئاستەنگەکان لەبەردەم گەیشتن بە چارەنووسی کۆتایی.

٨- بۆ لایەنە نێودەوڵەتییەکان

ا- بەشدارپێکردنی لایەنە لۆکاڵییەکان.

پێویستە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی هەوڵی کارا بدات بۆ ئەوەی حکومەتی عێراق و حکومەتی هەرێمی کوردستان بەشداریی کارا بە نوێنەرانی سیاسی کەرکوك (هەروەها ئەو پارتە سیاسییانەی کە نوێنەریان نییە لە حکومەتی خۆجێی کەرکوك) بکەن بۆ برەودان بە ئەگەرەکانی گەیشتن بە چارەسەری سیاسی. پێویستە هەوڵەکان لە خوارەوە بۆ سەرەوە هەڵبقوڵێن بۆ زامنکردنی رەوتێکی هێمنانە بەرەو هەر ریفراندۆمێك لە داهاتوودا. سەرەرای ئەوەی کە چارەسەری سیاسی پێویستی بە میکانیزمێکە کە لەسەر ئاستی سەرکردایەتییەوە شۆربێتە خوارەوە، راوێژکردن لەگەڵ کاراکتەرە سیاسییە ناوخۆییەکان زۆر گرنگە بۆ دارێژتنی ستراتیژییەتێکی یەکگرتوو کە نیگەرانییەکان لە بەرچاو بگرێت و خاوەندارێتی هەموو لایەنەکان زامن بکات.

ب - کارئاسانیکردن بۆ پیادەکردنی پرۆسەی دیالۆگ و ئاشتەوایی لەسەر ئاستی لۆکاڵی لە کەرکوك.

پێویستە کارئاسانی بکرێت بۆ ئەوەی پێکهاتەکانی شاری کەرکوك لەناوخۆیاندا پەیرەوی پرۆسەی دیالۆگ بکەن. بە دیالۆگ پەیوەندی نێوان پێکهاتەکان پتەو دەبێ و لایەنە لۆکاڵییەکان لێك نزیك دەکاتەوە. وە بۆ ئەوەی ئەو پرۆسەیە بەسەرکەوتووانە ئەنجام بدرێت پێویستە وەبەرهێنان لە بواری پەروەردە بکرێت، کە فاکتەرێکی سەرەکییە بۆ لێك نزیکردنەوەو یەکخستنی پێکهاتەکان. دیالۆگ و ئاشتەوایی بنچینەو بنەمایە بۆ گەیشتن بە چارەسەری سیاسی سەرکەوتووو لە هەمان کاتدا گرژییەکان کەمدەکاتەوە.

ج - پاڵپشتیکردنی دامەزراندنی پرۆسەیەکی سیاسی.

کۆمەڵگای نێودەوڵەتی رۆڵێکی گرنگی لە چارەسەرکردنی پرسی کەرکوکدا دەبێت. پێویستە کۆمەڵگای نێودەڵەتی پاڵپشتی خۆی بۆ حکومەتی عێراق و حکومەتی هەرێمی کوردستان مەرجدار بکات و ببەستێتەوە بە چارەسەری ئاشتیانەی ئەو پرسە گرنگە لە رێگەی پرۆسەی سیاسییەوە. بە گەرانەوەی بایەخ و جەختی نێودەوڵەتی بۆ عێراق، ئێستا کاتی ئەوەیە کە فشار بخرێتە سەر هەردوو حکومەتی عێراق و هەرێمی کوردستان بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییە درێژخایەنەکان. ئەوەش هاندەر دەبێت بۆ دروستکردنی ویست و ئیرادەی سیاسی بۆ گەیشتن بە رێکەوتن و جێبەجێکردنی بە سەرکەوتوویی.

**نەخشەی ژمارە ١: ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگە بەرلە حوزەیرانی ٢٠١٤**






**نەخشەی ژمارە ٢: ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگە لەدوای حوزەیرانی ٢٠١٤**



* سەرچاوەو پەراوێزەکان:-

١- فێریس، ئی.و ستۆڵتز، کەی. (٢٠٠٨). داهاتووی کەرکوك: ریفراندۆمو کاریگەرییەکانی لەسەر ئاوارەبوون. ئینستیتیوتی برۆکنیکز، ٣، لاپەرە ٨.

٢- بروانە "کەرکوك ئاماری قوربانیانی ٢٠١٤ رادەگەیەنێت" رووداو، ٢ کانوونی دووەمی ٢٠١٥ بەردەستە لە http // rudaw. Net/English / middle east /Iraq ٠٢١٢٠١.

٣- ناتالی، دی. (٢٠٠٨). گێژاوی کەرکوك، ئیتنۆپۆلەتیکس، ٧ (٤)، ٤٣٣- ٤٤٣. لاپەرە ٤٣٤.

٤- "تەئمیم" وشەیەکی عەرەبییە مانای "نیشتیمانیکردن"ە.

٥- ئەندەرسۆن، ئێل.و ستانسفیلد، گی. (٢٠٠٩). قەیرانەکان لە کەرکوك: ئیتنۆپۆلەتیکسی ململانێو سازشکردن. چاپخانەی زانکۆی پینسیلڤانیا. لاپەرە ٣٠.

٦- "وافد" واتای هاوردە دەگەیێنێت.

٧- رۆمانۆ، دی. (٢٠٠٧). داهاتووی کەرکوك ئیتنۆپۆلەتیکس، ٦ (٢٦)، ٢٦٥- ٢٨٣، ٢٨٣، لاپەرە ٢٦٦.

٨- هەمان سەرچاوە.

٩- ئەندەرسۆن، ئێل.و ستانسفیلد، گی. (٢٠٠٩). قەیرانەکان لە کەرکوك: ئیتنۆپۆلەتیکسی ململانێو سازشکردن. چاپخانەی زانکۆی پینسیلڤانیا. لاپەرە ٤٣.

١٠ - بروانە" عێراق: کوشتنو دەرکردن روو لە زیادبوونە لە کەرکوك" هیومان رایتس ووچ، ١٥ نیسانی ٢٠٠٣، بەردەستە لە ٢٠٠٣ /٤ /١٤ http// www. Hrw. Org / news /Iraq kllings – expulsions – rise – Kirkuk لە ٤ کانوونی دووەمی ٢٠١٥ سەیرکراوە.

١١ - فێریس، ئی. و ستۆڵتز، کەی. (٢٠٠٨). داهاتووی کەرکوك: ریفراندۆمو کاریگەرییەکانی لەسەر ئاوارەبوون. ئینستیتیوتی برۆکینگز، ٣ لاپەرە ٩.

١٢ - چاوپێکەوتنی ئینستیتیوتی مێری، کەرکوك، ١٩ کانوونی یەکەمی ٢٠١٤.

١٣ - ٨٣٦ قوربانی سیڤیل بە گوێرەی www Iraqbodycount.org لە ١٠ کانوونی دووەم ٢٠١٥ سەیرکراوە.

١٤- دەیڤید رۆمانۆ، داهاتووی کەرکوك ئیتنۆپۆلەتیکس، ٦ (٢٦)، ٢٦٥ - ٢٨٣، لاپەرە ٢٧١.

١٥- وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە، "فەرماندەیی ئۆپەراسیۆنی دیجلە لە کەرکوك پاشەکشە دەکات" لە ٢٤ تشرینی دووەم ٢٠١٤ سەیرکراوە.
http: / www. Krg.org/ a/ d. aspx? s = ٤٠٠٠٠. .&a = ٥١٧٠١

١٦- مایکل نایتسو ئەحمەد عەلی. کەرکوك لە قۆناغی گواستنەوە: دروستکردنی متمانە لە باکووری عێراق، ئینستیتیوتی واشینگتۆن، راپۆرتی سیاسی ژمارە ١٠٢، (٢٠١٠) لاپەرە ٩.

١٧- هادی ئەلعامری، کۆنگرەی رۆژنامەوانی، کەرکوك، ٢ کانوونی یەکەمی ٢٠١٤.

١٨- چاوپێکەوتنی ئینستیتیوتی مێری، هەولێر، ٢٧ ئابی ٢٠١٤.

١٩- جۆل وینگ، قوربانییەکانی گەرانەوەی کوردە عێراقییەکان بۆ ناوچە جێناکۆکەکان" ١٨ تەمموزی ٢٠١٤، ٢٠١٤/ http// musingsonirq . blogspot/costs/.٧ . com of – Iraqs – kurds – moving – into . html سەیرکراوە لە ٥ تشرینی دووەمی ٢٠١٤.

٢٠ - رێکخراوی کۆچی نێودەوڵەتی، پرۆفایلی پارێزگای کەرکوك ٢٠١٤، سەیرکراوە لە بەرواری ٣ی کانوونی دووەمی ٢٠١٥. ٨٩٤/. www. lomiraq . net / file / Download? Token = rkivr. Xa

٢١- رێکخراوی کۆچی نێودەوڵەتی " خشتەی بەدواچوونی ئاوارەکانی رێکخراوی کۆچی نێودەوڵەتی" لە بەرواری ١ی شوبات ٢٠١٥ سەیرکراوە. / iomiraq . net // http dtm – page

٢٢- پێویستە ئەوە بزانرێت کە ژمارەیەکی بەرچاو لە شەرکەری" ناعەرەب" بەشێوەیەکی چالاك لە نێو پێکهاتەکانی دەوڵەتی ئیسلامی دا هەن.

٢٣- دەقی ماددەی ٥٨ی یاسای بەرێوەبردنی دەوڵەت بۆ قۆناخی گواستنەوە بە زمانی ئینگلیزی لەم ویبسایتە دەستدەکەوێت: / http// web. Archive . org Web/ ٢٠٠٩٠٤٢٣٠٦٤٩٢٠ government/tal . html/ http//www.c Cpa – Iraq . org لە بەرواری ١٥ی ئازاری ٢٠١٥ سەیر کراوە.

٢٤- بری٠٠، ٠٠٠، ٢٠ دیناری عێراقی.

٢٥- کۆبوونەوەی تایبەت لەگەڵ نوێنەرانی پێکهاتەکان، کەرکوك ٣ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٤.

٢٦- کۆبوونەوەی تایبەت لەگەڵ نوێنەرانی پێکهاتەکان، کەرکوك، ٣ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٤.

٢٧- هەمان سەرچاوە.

٢٨- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ١٤ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٤.

٢٩ - هەمان سەرچاوە.

٣٠- ئامارەکانی ژمارەی مامەڵە پێشکەشکراوەکان لە لیژنەی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠/ ئۆفیسی کەرکوك وەدەستهێنراوە.

٣١- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ٣ی تشرینی دووەمی ٢٠١٤.

٣٢- پیتە بارتۆ" ململانێ لەگەڵ یەکپارچەیی نەتەوەیەك: سنوورە ناوخۆ ناکۆکی لەسەرەکانی عێراق" ئینتەرناشنال ئەفیرس ٨٦ ژمارە ٦، (٢٠١٠) لاپەرە ١٣٣٥.

٣٣- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری هەولێر، ٢٧ی تشرینی دووەمی ٢٠١٤.

٣٤- لیام ئەندرسۆنو گاریث ستانسفیلد، قەیرانەکان لە کەرکوك: ئیتنۆپۆلەتیکسی ململانێو سازشکردن (فیلادلفیا: پی ئی ئینئین، ٢٠٠٩). لاپەرە ٢٦٨.

٣٥- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ١٩ی ئابی

٢٠١٤.
٣٦- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، ٢٧ی تشرینی دووەمی ٢٠١٤.
٣٧- کۆبوونەوەی تایبەت لەگەڵ نوێنەرانی پێکهاتەکان، کەرکوك، ٣ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٤.
٣٨- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، سلێمانی، ٢٧ی تشرینی دووەمی ٢٠١٤.
٣٩- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ١٩ی نیسانی ٢٠١٥.
٤٠ چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ٢ی شوباتی ٢٠١٥.
٤١- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ٢٧ی ئابی ٢٠١٤.
٤٢- چەمکی هەڵسوراندنی ریفراندۆم لە کەرکوك، سەنتەری دیموکراسییەت و کۆمەڵگای مەدەنی لە زانکۆی جۆرج تاون، (٢٠١٣).
٤٣- ستیڤن وۆلف، حوکمرانی کردن (لە) کەرکوك: چارەسەرکردنی دۆخی ناوچە جێناکۆکەکان لە عێراقی پاش ئەوریکا، ئینتەرناشنال ئەفیرس، ٦: ٨٦، (٢٠١٠)، ١٣٦١ - ١٣٧٩. لاپەرە ١٣٧٦.
٤٤- ستیڤن وۆلف، حوکمرانی کردن (لە) کەرکوك: چارەسەرکردن دۆخی ناوچە جێناکۆکەکان لە عێراقی پاش ئەمریکا، ئینتەرناشنال ئەفیرس، ٦: ٨٦، (٢٠١٠)، ١٣٦١ - ١٣٧٩). لاپەرە ١٣٧٧.
٤٥- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ٢٣ی ئابی ٢٠١٤.
٤٦- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ٢٦ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٤.
٤٧- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ٢٣ی ئابی ٢٠١٤.
٤٨- چاپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ٢٦ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٤.
٤٩- پێویستە ئەوە لەبیر نەکرێت کە زۆرێك لە کۆمەڵگای عەرەبی لەسەر ئاستی عێراق بایکۆتی دەنگدان لەسەر دەستووری عێراقی کرد لە ساڵی (٢٠٠٥).
٥٠- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ٢٦ی ئایار ٢٠١٤.
٥١- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ٢٦ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٤.
٥٢- یاسای ژمارە ١٣ کە لە ساڵی ٢٠٠٨ لەلایەن پەرلەمانی عێراقەوە دەرچووە.
٥٣- کۆبوونەوەی تایبەت لەگەڵ نوێنەرانی پێکهاتەکان، کەرکوك، ٣ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٤.
٥٤- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ٢٦ی ئابی ٢٠١٤.
٥٥- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ٢٦ی ئابی ٢٠١٤.
٥٦- هەمان سەرچاوە.
٥٧- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، سلێمانی، ٢٧ی تشرینی دووەمی ٢٠١٤.
٥٨- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ٢٦ی تشرینی دووەمی ٢٠١٤.
٥٩- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، هەولێر، ٢٧ی تشرینی دووەمی ٢٠١٤.
٦٠- چاوپێکەوتنی دامەزراوەی مێری، کەرکوك، ٢٧ی تشرینی دووەمی ٢٠١٤.

*** بەهەرێمکردنی کەرکوك هەڵەیەکی مێژوویی کوشندەیە؟**

**خالید شوانی**

لەبنەرەتدا پرۆژەی بە هەرێمکردنی کەرکوك پرۆژەیەکی ستراتیژی تورکیایە بەمەبەستی دەستبەسەراگرتنی نەوتی کەرکوکە هاوشێوەی نەوتی هەرێمی کوردستان و سەپاندنی هەژموونی تورکیایە بەسەر کەرکوکدا بۆ بەهێزکردنی پێگەی تورکمان و عەرەبی سونەیە بەرامبەر بە کورد کە لە دوای هاتنی داعشەوە پێگەیەیان لە دەستداوە.
لێرەوە باسی بەشێك لە مەترسییەکانی بەهەرێمکردنی کەرکوك دەکەم لە رووی (دەستووری، ئابووری، سەربازی، ئیداری، دیمۆگرافی)یەوە.

**١- مەترسی دەستووری و قانونی:-**

نە لە دەستوور نە لە یاسای دروستکردنی هەرێمەکاندا رێگە پێدراوە کە دوو هەرێم یەکبگرن کە واتا دوای بەهەرێمکردنی کەرکوك ئاستەمە لەگەڵ هەرێمی کوردستان یەك بگرێتەوە.

**٢- مەترسی ئابووری:-**

بەپێچەوانەی ئەو بۆ چوونانەی کە پێیان وایە بەهەرێمکردنی کەرکوك باری ئابووری کەرکوکییەکان باشتر دەکات، بەڵکو بەهەرێمکردنی کەرکوك مەترسییەکی گەورە لەسەر ئابووری کەرکوك دروست دەکات لەبەر ئەوەی فرۆشتنی نەوت سەرچاوەی داهاتی سەرەکی دەبێت، بەڵام لە ئێستادا زیاتر لە (٤٠٠٠٠٠) چوار سەد هەزار بەرمیل نەوتی کەرکوك لەلایەن هەرێمی کوردستانەوە هەناردە دەکرێ، بەمەش تەنها (١٤٠٠٠٠) سەدوچل هەزار بەرمیل نەوت بۆ کەرکوك دەمێنێتەوە، ئەم رێژەیەش نەك هەر بەشی خزمەتگوزاری و خۆشگوزەرانی ناکات، بەڵکو بەشی چارەگە موچەیەکی فەرمانبەرانی شارەکە ناکات بە فەرمانبەرانی بەغداو هەرێمەوە کە نزیکەی (١٠٠٠٠٠) سەد هەزار فەرمانبەرن.
وێرای ئەوەی نەوتی کەرکوك لە رێگای تورکیا هەناردە دەکرێ و تورکیاش وەکو کارتی گوشار بەکاری دەهێنێ بۆ ئەوەی کەرکوك بکات بەبەشێك لە ململانێ ئیقلیمییەکانی خۆی لەناو عێراق و کوردستان.
ئەمە جگە لەوەی پرۆسەی وەبەرهێنان هەروەها ئابوورییەکی پتەوو کشتوکاڵ و پیشەسازی و بازرگانی و سیستەمی بانقی لە کەرکوکدا بوونی نییە کە بتوانرێ پشتی پێ ببەسترێ.

**٣- مەترسی سەربازی:-**

لەرابردوودا هەرەشەیەکی سەربازی لەلایەن نەیارانی کوردەوە بەمەبەستی لاوازکردنی پێگەی کورد لە کەرکوك هێزی پێشمەرگەی کوردستان پارێزەری بووە هەروەها لەگەڵ هاتنی داعشدا بەگیانفیدایی و خوێنی پێشمەرگە ئەم ناوچەیە پارێزراوە، دیارە پێشمەرگە قارەمانەکان لە گەرمیان و کوێستانەوە لەپێناو ئەوەی کەرکوك بەشێکە لە خاکی کوردستان گیانی خۆیان بەختکردووە، لە داهاتووشدا هێزی پێشمەرگەی کوردستان تاکە هێزە کە کەرکوك دەپارێزێ لەهەر هەرەشەو مەترسییەك کە رووبەرووی کەرکوك ببێتەوە لەلایەن نەیارانی کوردەوەو هێزەکانی ئاسایش رێگر دەبن لە شاڵاوەکانی پەلاماری تیرۆرستی و ئۆتۆمبێلە بۆمبرێژەکان بۆ سەر ناوچە کوردییەکان و بەکارهێنانی تیرۆر بۆ دەستکەوتی سیاسی، گەر کەرکوك قووڵاییەکی فراوانی کوردستانی هەبێ، لە توانایدا دەبێت رووبەرووی هەر مەترسییەکی سەربازی ببێتەوە لە ئەگەری دروستبوونی هەرێمێکی سوننی یان لەلایەن بەغداوە.

**٤- مەترسی ئیداری:-**

ئەو هەرێمەی کە تورکیا و تورکمان پێی رازین، دەبێت ئیدارەیەکی هاوبەشی هەبێ ئەگەر کورد سەرۆکی هەرێم بێت ئەوا دەبێت تورکمان سەرۆکی حکومەت و عەرەبیش سەرۆکی پەرلەمان، بۆیە بەردەوام کورد لەبەردەم مەترسی هاوپەیمانێتی عەرەب و تورکماندا دەبێت، ئەمە جگە لەوەی تورکمان هەرێمی کەرکوکی بەم سنوورە ئیدارییەی ئێستای شارەکە دەوێت، مەبەستیشیان لەم هەڵوێستە روون و ئاشکرایە.

**٥- مەترسی دیمۆگرافی...**

بەپێی ئامارەکانی وەزارەتی تەندروستی و پلاندانان رێژەی زیادبوونی دانیشتوانی حەویجەو دەورووبەری لە ئاستێکە کە لە ١٥ ساڵی داهاتوودا دەبنە زۆرینەی شاری کەرکوك، ئەمە بێجگە لە بوونی نزیکەی نیو ملیۆن عەرەب کە لە دوای ٢٠٠٣ و شەری داعشەوە هاتونەتە کەرکوك، ئەمەش وا دەکات کە کورد جارێکیتر دوای ئەم هەموو تێکۆشان و قوربانیدانە لە چوارچێوەی ئەو هەرێمە سەر بەخۆیەدا بە دەستی خۆی دەکەوێتەوە ژێر دەسەلات و حوکمی زۆرینەی عەرەبی کەرکوك.
دیارە لە دوای هاتنی داعش بوونی پێشمەرگە لە کەرکوك ئاسۆیەکی نوێی بەرووی کەرکوك و کوردستاندا کردووەتەوەو هەموو ئەگەرێك لە عێراق کراوەیە بۆ نموونە دروستکردنی هەرێمی سوننە لە عێراقدا، ئەمەش وا دەکات پێویست نەکات کورد دەست بەرێت بۆ سیناریۆی بەهەرێمکردنی کەرکوك، چونکە لە حاڵەتی دروستبوونی هەرێمی سوننەدا ناوچە عەرەب نشینەکانی کەرکوك بچنە سەرئەو هەرێمە یان بۆ نموونە حەویجەو دەورووبەری بکرێتە پارێزگایەکی عەرەبی سوننی کە ئەگەرێکەو چەندین جار باسی لێوە کراوە، ئەمە بە ئاسانی وادەکات کەرکوك بگەرێتەوە سەر کوردستان.
پێویستە هەڵسوکەوتی خەمساردانەو بێباکانەی حکومەتی هەرێم بەرامبەر کەرکوك کۆتایی پێ بهێنرێ بەڵکو ئەو هەڵوێستانە بە ئاراستەی بەدەستهێنانی متمانەی کوردی کەرکوك و پێکهاتەکانی تری بێت نەك دوورکەوتنەوەیان لە کوردستان و شەری بە دیموکراتی کردنی کوردستان و پاراستنی ماف مرۆڤ و ئازادی رادەربرین و چارەسەرکردنی قەیرانی سیاسی و ئابووری و بوونی شەفافیەت هۆکاری گرنگن بۆ بەدەستهێنانی متمانەی زیاتری هاووڵاتیانی کەرکوك بە کوردستان و ئەزموونە حوکمرانییەکەی.

*** گەڕانەوەی کەرکوك بۆ ناوچەیەکی ئۆتۆنۆم بەسەر هەرێمی کوردستان**

**د. نوری تاڵەبانی**

هەڵوێستی بەشی زۆری لایەنە سیاسییەکانی عێراقی دەربارەی دواڕۆژی ناوچەی کەرکوك گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە، حکومەتی عێراق کە بەرپرسی یەکەمە لە جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠) هەوڵی " چارەسەرکردنی" کێشەی ناوچەی کەرکوکی لە دەرەوەی ئەو مادە دەستوورییە داوە. کورد بە بەردەوامی داوای جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠)ی کردووە، لەپاش ٣١ی دیسەمبەری (٢٠٠٧) خەریکی داکۆکیکردن بووە لە مانەوەی ئەو مادەیە لەگەڵ پووچەڵکردنەوەی ئەو پروپاگەندانەی سەبارەت بەسەرچوونی ماوەکەی بڵاوکراونەتەوە. لەڕووی مادییەوە حکومەتی ناوەندیی هاوکاری لیژنەی جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠)ی کردووە، بەڵام راستەخۆو ناراستەوخۆ کۆسپ‌و تەگەرەی بۆ دروستکردووە بەمەبەستی دواخستنی جێبەجێکردنی، نوێنەرایەتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ هاوکاریکردنی عێراق (یۆنامی) لەگەڵ ئەمەریکا و بەریتانیا بەشێوازی جیاواز هەوڵی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەیانداوە، بەڵام نەگەیشتوونەتە دەرئەنجامێکی قبوولکراو لەلایەن لایەنە پەیوەندیدارەکان لە کەرکوك. کات بەسەرچوون لە بەرژەوەندیی کورد نییە، ئەوەی لە ٢٠٠٣ دەکرا ئێستا ناکرێت، ئەوەی ئەمڕۆ دەکرێت سبەینێ سەرناگرێ. ترسی گەورە لەوەدایە کێشەی ناوچەی کەرکوك بە چارەسەرنەکراوەیی بمێنێتەوەو ببێتە کێشەیەکی درێژخایەن لە چەشنی ئەو کێشانەی نەتەوە یەکگرتووەکان نەیانتوانیوە چارەسەری بکەن، وەك کێشەی کشمیرو دارفۆر. دەوڵەتانی ناوچەکە ناراستەوخۆ دەستیان خستووەتە ناو کێشەی کەرکوك لە رێگای چەند لایەنێکی سیاسی عێراقی بەمەبەستی ئاڵۆزکردنی و مانەوەی بەچارەسەرنەکراوی.

بارودۆخی ناوچەی کەرکوك خەریکە وەك گۆمەئاوێکی لێبێ کە بەرەو بۆگەنی دەچێت، لە ئاکامدا پڕکردنەوەی دەبێتە رێگای " چارەسەرکردنی" باسکردنی ئەو راستییە تاڵانە بۆ هاندانی دەسەڵاتدارانی کوردە تا رێگا چارەیەکی گونجاو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك بدۆزنەوە. دەبێ ئاگاداری لایەنە پەیوەندیدارەکانی عێراقی و نێودەوڵەتی لەو راستییە بکرێت کە چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك دەبێتە هۆی چارەسەرکردنی بەشی زۆری کێشەکانی دیکەی عێراق، بەشی زۆریان ئەو راستییە دەزانن، بەڵام بەکردەوە کاری جددی بۆ کۆتایی هێنان بەو کێشە گەورەیە ناکەن.

لە ناوەراستی تەمووزی ساڵی (٢٠٠٩) شاندێکی (یۆنامی) بەسەرۆکایەتی بەرپرسی ئۆفیسی سیاسی‌و دەستووری هاتە هەولێر بەمەبەستی دۆزینەوەی رێگا چارەیەکی گونجاو بۆ کێشەی ناوچەی کەرکوك. لەسەر داوای شاندەکە رۆژی (٢٠)ی تەمووز نزیکەی دوو کاتژمێر پێکەوە دانیشتین، لەو چاوپێکەوتنەدا بیروڕای جیاواز خرانەڕوو و گفتوگۆیان لەسەر کرا. ئەمە یەکەمجار نییە لەگەڵ نوێنەرانی یۆنامی‌و چەند بەرپرسێکی پایەبەرزی ئەمریکی‌و بەریتانی لەسەر داوای ئەوان پێکەوە دابنشین‌و گفتوگۆ لەسەر کێشەی کەرکوك بکەین، بەڵام لە چاوپێکەوتنی رۆژی (٢٠)ی تەمووز راوبۆچوونەکان راشکاوانە خرانەڕوو، ئاماژە بۆ ئەو کۆسپانەشکرا کە بوونەتە هۆی دواکەوتنی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە. ئەرکی هەموو کوردێکی دڵسۆزە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك بدات. بەڵام دەبێ ئاگاداری راوبۆچوونەکانی لایەنەکانی دیکە بێت. جێگای داخە بەشی زۆری ئەو لایەنانە زانیاری راست‌و دروستیان لەسەر کێشەی کەرکوك نییە، خۆشیان دوورەپەرێز دەگرن لێدوان لەسەر جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠)، بەشێکیان جێبەجێکردنی بەکارێکی مەترسیدار دەزانن!

چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك بەو شێوەیەی تا ئێستا هەڵسوکەوتی لەگەڵکراوە سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە، کاتی ئەوە هاتووە بەشێوەیەکی دیکە هەوڵی چارەسەرکردنی بدرێت، بەمەرجێ دەرئەنجامەکەی گەڕانەوەی ناوچەی کەرکوك بێت بۆسەر هەرێمی کوردستان. پێکهاتەی ئەتنی ناوچەی کەرکوك وەك ناوچەکانی دیکەی هەرێمی کوردستان نییە، تورکمان‌و عەرەب‌و کلدو ئاشووری رەسەن دەمێکە لەگەڵ کورد پێکەوە دەژین، دەبێ ئەوەش لەبیر نەکرێت چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك پەیوەندی بە هەڵوێستی لایەنە سیاسییەکانی عێراقی‌و ئەو گۆڕانکارییانەی لەسەر گۆڕەپانی سیاسی عێراق روودەدەن هەبووەو هەیە، ئەنجامی هەڵبژاردنی ئەنجومەنەی نوێنەرانی عێراق کە بڕیارە لە (١)ی دیسەمبەری (٢٠١٠) رێکبخرێت رەنگدانەوەی راستەوخۆی لەسەر چۆنییەتی چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك دەبێ. لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی دەوڵەتە زلهێزەکان حیسابی تایبەت بۆ بەرژەوەندیی خۆمان‌و دەوڵەتانی ناوچەکە دەکەن. ئەم هۆکارانە بوونەتە کۆسپ لەبەردەم گەڕانەوەی ناوچەی کەرکوك بۆ سەر هەرێمی کوردستان، ئەگینا کەرکوك لەگەڵ ناوچە دابڕاوەکانی دیکەی کوردستان دەبوو پاش رووخانی رژێمی بەعس لە (٢٠٠٣) بخرێنە سەر سنووری هەرێمی کوردستان.

نەیارانی کورد تۆمەتی ئەوە دەخەنە پاڵی گوایە لەبەر سامانی نەوت‌و گاز داوای کەرکوك دەکەن، کورد دەبێ بەکردەوە بیسەلمێنێ سامانی نەوتی کەرکوك هۆکاری داواکردنی گەڕانەوەی نییە بۆسەر هەرێمی کوردستان، ئەو داوادەکات داهاتی نەوتی کەرکوك بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکە تەرخانبکرێت لەگەڵ یارمەتیدانی دانیشتوانی بەهەموو پێکهاتەکانییەوە. لەم روانگەوە پێشنیازی گەڕانەوەی ناوچەی کەرکوکم بۆسەر هەرێمی کوردستانم کرد وەك ناوچەیەکی ئۆتۆنۆم، تێیدا دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی کاروباری پەیوەندیدار بە نەوت‌و گاز بەو ناوچەیە بدرێ، بەرەچاوکردنی ئەو مادده حەسرییانەی لەو بارەوە لە دەستووری عێراقدا هاتوون. قبوولکردنی ئەو پێشنیازە دەبێتە هۆی دامەزراندنی دوو ئەنجومەن، یەکێکان بەناوی (ئەنجومەنی بڕیاردەر) کە ئەندامەکانی لەلایەن خەڵکی ناوچەکەوە هەڵدەبژێدرێن. ئەنجومەنی دووەم بەناوی

(ئەنجومەنی بەڕێوەبردن)، سەرۆك‌و ئەندامانی لەلایەن ئەنجومەنی یەكەوە دەستنیشان دەكرێن. ئەو دوو ئەنجومەنە دەسەڵاتی تەواویان دەبێ لەبەڕێوەبردنی كاروباری سیاسی‌و ئابووری‌و ئاوەدانكردنەوەو پەرەپێدان‌و ئەمنی‌و پەروەردە. مانەوەی هێزی پێشمەرگە لەگەڵ ناردنی هێزی چەكداریی عێراقی بۆ ناوچەكە دەبێ بەڕەزامەندی ئەو دوو ئەنجومەنە بێت، بەرەچاوكردنی ئەو حاڵەتانەی لەدەستووری عێراق‌و دەستووری هەرێمی كوردستان دیاری كراون. پرسیاری چۆنییەتی دیاریكردنی سنووری ناوچەكەیان لێكردم، وتم سنووری پارێزگای كەركوك پێش ساڵی (١٩٧٦) بكرێتە سنووری ناوچەكە، ئەوەش لە برگەیەكی مادەی (١٤٠)دا ئاماژەی بۆكراوە. پەیوەندی ناوچەی كەركوك بە هەرێمی كوردستان دەبێ بەڕوونی لە دەستووری هەرێم‌و لە دەستووری عێراق دیاری دەكرێت. لەبەر ئەوەی ناوچەی كەركوك دەبێتە بەشێك لە هەرێمی كوردستان، دانیشتوانی بەهەڵبژاردنی ئازاد نوێنەرانی خۆیان بۆ پەرلەمانی هەرێم دەنێرن، ژمارەیان لەو پەرلەمانە بەپێی نفووسیان دیاری دەكرێت. چەند پۆستێكی وەزاریی لە حكومەتی هەرێم دەبێ بدرێتە كەسانێكی خەڵكی كەركوك، دەكرێ پۆستی جێگری سەرۆك وەزیران یان جێگری سەرۆكی هەرێم بە توركمانێكی خەڵكی كەركوك بدرێت، پرسیاری زەمانەتی مانەوەی ناوچەكەیان لێكردم وەك ناوچەیەكی ئۆتۆنۆم لە هەرێمی كوردستان؟ ئەو سیستەمە گەر پەسەندكرا ناكرێ لەلایەن پەرلەمانی هەرێم‌و پەرلەمانی عێراقەوە دەستكاری بكرێت، چونكە لە دەستووری هەرێمی كوردستان‌و لە دەستووری عێراق زەمانەتی مانەوەی وەك ناوچەیەكی ئۆتۆنۆم دەچەسپێنرێت. بۆ زەمانەتی زیاتر پێشنیازی بەستنی كۆنفرانسێكی نێودەوڵەتیم كرد، بە بەشداری عێراق‌و هەرێمی كوردستان‌و چەند دەوڵەتێكی زلهێزو دەوڵەتانی ناوچەكە لەژێر چاودێری نەتەوە یەككگرتووەكان بۆ ئەو مەبەستە. بەم شێوە هەردوو دەستووری عێراق‌و هەرێمی كوردستان لەگەڵ ئەو كۆنفرانسە نێودەوڵەتییە دەبنە زەمانەتی مانەوەی ناوچەی كەركوك بەو ستاتوورە یاساییەی پەسەندكراوە، هیچ لایەنێك بەتەنیا ناتوانێ لە ئایندەدا دەستكاری بكات. بوونی زەمانەتی نێودەوڵەتی ڕێگا لە دەستێوەردانی دەرەكی لە كاروباری ناوچەی كەركوك دەگرێت. دوا پرسیاریان دەربارەی ئەگەری دامەزراندنی دەوڵەتێكی سەربەخۆبوو لە هەرێمی كوردستان، لەم حاڵەتەدا ناوچەی كەركوك چی بەسەردێت؟ وەڵامم ئەوەبو دروستكردنی دەوڵەتێكی سەربەخۆ لە هەرێمی كوردستان بەبڕیاری نێودەوڵەتی دەدرێت، كۆسۆفۆ باشترین نموونەیە كە سەرەتا داوای حوكمیزاتی لە چوارچێوەی كۆماری سربیا دەكرد، بەڵام بە بڕیارو پشتگیریكردنی چەند دەوڵەتێكی زلهێز سەربەخۆیی بەدەستهێنا، ئەو ئەگەرە بەداخەوە ئێستا لە ئاسۆی كوردستان بەدی ناكرێ.

ئەم پێشنیازە پاش لێكۆڵینەوەی زیاتر بەمەبەست دەوڵەمەندكردنی، دەكرێ وەك پرۆژەیەك پێشكەش بەلایەنە پەیوەندیدارەكانی عێراقی‌و نێوەدوڵەتی بكرێت. لەو باوەڕەدام كورد ئەم پێشنیازە قبووڵ دەكات، چونكە دەبێتە هۆی گەڕانەوەی ناوچەی كەركوك بۆسەر هەرێمی كوردستان. نوێنەرانی توركمان‌و عەرەب‌و كلدو ئاشوری لە كەركوك گەر پێشنیازەكە قبووڵ بكەن، ناوچەی كەركوك دەبێتە ناوچەیەكی ئۆتۆنۆم تێیداو كاروباری ناوچەكە لەلایەن هەردوو ئەنجومەنی بڕیاردەرو بەڕێوەبردن بەڕێوەدەبرێن. ئەگەر لایەنە توندڕەوەكانی توركمان‌و عەرەب ڕەتی بكەنەوە، كورد لەگەڵ دۆستەكانی دەتوانن بانگەشەی بۆبكەن، بەتایبەتی لەكاتی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگای كەركوك. سەركەوتنی ئەو لیستەی كورد پشتگیری لێدەكات لەو هەڵبژاردنەدا ئەگەری پەسەندكردنی پرۆژەكە زیاتر دەكات. پەرلەمانی هەرێمی كوردستان‌و ئەو ڕێكخراوانەی لە ناوەوەو دەرەوەی كوردستان داكۆكی لە مەسەلەی كەركوك دەكەن، لەگەڵ دۆستانی كورد لە دەرەوەدا دەتوانن پشتگیری لە پرۆژەكە بكەن‌و پەیوەندی بە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق‌و پەرلەمانەكانی ئەوروپاو كۆنگرێسی ئەمەریكی بكەن، تا ئەوانیش پشتگیری لە پرۆژەكە بكەن، كە دەبێتە هۆی چارەسەركردنی كێشەی ناوچەی كەركوك بۆماوەیەكی دوورو درێژ.

*** ناوچە کێشە لەسەرەکان:-**

**عەبدولحەکیم خەسرەو جوزەل**

کێشانی سنووری هەرێمی کوردستان، کۆتایی هێنان بە شوێنەواری بە عەرەبکردن و گۆڕانکاری دیمۆگرافی ناوچە کوردستانییەکان، یەکێك بوو لەو کێشە گەورانەی کە هەردەم لە رابردوودا دەبوو هۆکاری بە ئەنجام نەگەیاندنی رێکەوتنەکانی نێوان سەرکردایەتی بزووتنەوەی رزگاریی کوردو حکومەتە یەك، لە دوای یەکەکانی عێراق، بۆیە لە ژێر ناوی (المناطق المتنازع علیها - ناوچەکانی کێشە لەسەر) جێگرکرا لە یاسای (إدارة الدولة للمرحلة الإنتقالية) لە ماددەی (٥٨)و هەروەها لە ماددەی (١٤٠) لە دەستووری عێراق لە ساڵی (٢٠٠٥)، کە ئاماژە بە پێویستی دووبارە رێکخستنەوەی ئەم ناوچانە دەکات، لەسەر بنەمای هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکانی (مجلس قيادة الثورة)ی هەڵوەشاوە، بڕیارەکانی حکومەتی عێراق و لیژنەی (شؤون الشمال) بۆ گۆڕینی سنووره کارگێڕییەکان، لەدوایدا هەستان بە رێکخستنی سەرژمێری گشتی بۆ ئەم ناوچانە لەسەر بنەمای سەرژمێری گشتی ساڵی (١٩٥٧)، کە کۆتایی بێت بەگشت پرسی وەکو دەربڕی هەستی خەڵکی ئەم ناوچانە کە گوایە لەسەر هەرێمی کوردستان دەمێننەوە یان وەکو ئەوەی کە هەیە دەمێنیەوە.

گەلێك گۆڕانکاری بووە ئاستەنگ لە کۆتاییهێنان بەم کێشەیە لە ناوچە کێشە لە سەرەکان، بە تایبەتی لە دەوری حکومەتی عێراق لە جێبەجێکردنیدا لە بەڕێوەچوونی بڕگەکانی، دەوری نەرێنی ئەمریکی لە ماوەی راسپاردەکانی (بیکر-هاملتون) لە ساڵی (٢٠٠٦)، بە دواخستن لەسەر چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك و ناوچە کێشە لە سەرەکان.

حکومەتی عێراق کێشەی ناوچە لە سەرەکانی وەکو وەرەقەی فشار بەکاردەهێنا بەرامبەر هەرێمی کوردستان و لایەنە سیاسییە سونییەکان، کە سەرکردەکانی دەوڵەتی قانوون بە ئاشکرا ململانێی (کوردی-عەرەبی)یان دەقۆستەوە، کە دەسەڵاتدارانی پێشووی عێراقی نەدەگیشتن پێی، هەرچەندە توندوتیژیان دژی هاووڵاتیانی کورد بەکاردەهێنا، تا ئەو ئاستەی کە حیزبە سیاسییەکانی کوردستان هیچ لە بانگەوازو بەیانەکانیادا یا لە سیاسەتەکانیاندا لە باسکردنی رووداوی ئەنفال و هەڵەبجەدا یان لە پرۆسەکانی بەعەرەبکردنی لە دژی گەلی کورد، تاوان یان ئەرکی ئەو تاوانەیان نەدەخستە سەر هاووڵاتی عەرەبی تا بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی گرژبوونەوەی نەتەوەیی لە عێراقدا.

دیارترین گۆڕانکارییەکانی کێشەی کورد لە عێراق دوای ساڵی (٢٠٠٣)، بریتی بووە لە گرژبوونی بەربەرەکانی (عەرەبی - کوردی)، وە بۆ یەکەم جار هەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقییەوە لە ساڵی (١٩٢١)وە ئەوە بەرچاو دەکەوێت کە حکومەتی عێراق هەوڵی داوە بۆ بەهێزکردنی کوردو عەرەب لە پارێزگاکانی باکوورو رۆژئاوای عێراق.

*** سەرچاوە:-**

**- عشر سنوات هزت العالم عقد على إحتلال العراق (٢٠٠٣ - ٢٠١٣)، کۆمەڵێك نووسەر، المركز العربي للابحاث ودراسة السياسات، بيروت، (٢٠١٥)، لاپەڕە (٢٢٧ - ٢٢٨).**

***بەهەرێمکردنی کەرکوك:-**

**د. نەجمەدین کەریم**

بەر لە دۆخی ئابووری پێویستە باسی دۆخی ئەمنی بکەین. لە ڕووی ئەمنییەوە نێو شاری کەرکووك لەلایەن پۆلیس‌و ئاسایشەوە بەباشی پارێزراوە. دەوروربەرەکەشی پێشمەرگە پاراستوویەتی. هەماهەنگییەکی باش هەیە لەنێوان ئیدارەی کەرکووك‌و هێزی پێشمەرگە. نەخێر، پێشمەرگە پاراستوویەتی. حەشدی شەعبی لە کەرکووك خەڵکی ناوچەی تازەو بەشیرو ئەوا برا شیعانەن کە لە داقوقن‌و پارێزگاری لە ناوچەکانی خۆیان دەکەن.

لە ساڵی ٢٠١٤ەوە باری ئابووریمان بەرەو خراپی ڕۆیشتووە، چونکە لە ٢٠١٤ لە عێراق بودجە دەنگی بۆ نەدرا، دواتریش داعش هات. ئێمە لە سەرەتای ئەمساڵەوە هەتاوەکو ئێستا یەك دینارمان لە بەغداوە بۆ نەهاتووە. جگە لەوەی دووجار ٢٠٠ ملیۆن دینار بۆ پاککردنەوەی شارەکە هاتووە.

ئەو پێشمەرگانەی لە کەرکووکن، مووچە لە هەرێمی کوردستان وەردەگرن. زۆربەی مووچەخۆری کورد لە کەرکووك مووچەکەی لە هەرێمی کوردستانە زیاد لە ٨٠٠٠ کارمەندی خوێندنی کوردی لە کەرکووك مووچە لە هەرێمی کوردستان وەردەگرن. ئاسایشی کەرکووك مووچەی لە هەرێمی کوردستانە.

شەهید و پێشمەرگەی دێرین مووچەکەیان لە هەرێمی کوردستانە. هەرێمی کوردستان لە مانگی حەوتی ٢٠١٤ەوە سەرپەرشتی ٦٠٪ی نەوتی کەرکووك دەکات لە ڕێگەی کۆمپانیای کارەوە. ئەم نەوتە دەنێردرێتە دەرەوەو دەدرێت بە پاڵاوگەکان، هەرێمی کوردستان لەو ڕووەوە سوودمەند بووە. ئێمە لەو نەوتە پارەی پترۆدۆلارمان وەرگرتووە، بەڵام لە مانگی چوارەوە وەرماننەگرتووە.

لە ساڵی ٢٠١٤ەوە هیچ پارەیەکی پترۆدۆلارمان لە بەغدا وەرنەگرتووە. لە هەرێمی کوردستان کە ئەو ڕیککەوتنەمان کردووە، هەرێمی کوردستان لە مانگی حەوتی ٢٠١٥ەوە هەتاوەکو مانگی چواری ئەمساڵیش ١٠٠٪ی نەوتی کەرکوکی دەناردە دەرەوە. ئێمە ڕێککەوتووین پترۆدۆلار وەربگرین، بەڵام لە مانگی سێوە بەغدا ئەو ٤٠٪ی ڕاگرت کە لە ڕێگەی هەرێمی کوردستانەوە هەناردە دەکرا، بەبیانووی ئەوەی ڕێککەوتن لە نێوانیاندا هەیە کە هەرێمی کوردستان دەبێ پارەی ئەو نەوتەی لە ڕێگەی سۆمۆووە دەینێرێ، تەسلیمی بەغدای بکات.

نەدەبوایە بەغدا ئەو کارە بکات. ئەوە لە سێ لاوە زەرەری هەیە. یەکەم: کەرکووك پترۆدۆلاری نەما. دووەم: هەندێك نەوت دەردەهێنەری بۆ ئەوەی غازیشی لەگەڵ دەربێت‌و دواتر نەوتەکە دەخرێتەوە نێو بیرەکان، ئەوەش زەرەر بە بیرە نەوتەکان دەگەیەنێت. سێیەم: بەغدا دەزانێت ئەمڕۆ هەرێمی کوردستان قەیرانی دارایی هەیە کە ئەوەش دەکات گوشارێکی زیاترە بۆ سەر هەرێمی کوردستان، ئەمەش پەیوەندییەکان خراپتر دەکات.

کەرکووك قازانج دەکات نەوتەکەی دەربهێنرێت‌و بنێردێتە دەرەوەو بفرۆشرێت، جا هەر کەسێك بیکات. بەغدا ناتوانێت بیکات. بەغدا لە مانگی سێی ٢٠١٤ەوە نەیتوانیوە نەوتی کەرکووك بنێرێتە دەرەوە. چونکە تیرۆریستان پێش داعش لە سەڵاحەددین بۆری نەوتی کەرکووکیان دەتەقاندەوە. لەدوای داعشیشەوە تەنیا ڕێگا بۆ ناردنی نەوتی کەرکووك لە ڕێگای هەرێمی کوردستانەوەیە.

باسی نەوتی هەرێمی کوردستان لە میدیاکان زۆر دەکرێ، بە نیسبەت بەغداشەوە، لەوێش گەندەڵی زۆرە، ئێمە بینیمان چی لەبارەی کۆمپانیای ئێکس مۆبیل بڵاوکرایەوە کە چۆن پارە دزراوەو ئیشەکان چۆن کراون. بەڵام ئێمە لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە ئەو ڕێککەوتنامەیەی لەگەڵ هەرێمی کوردستان هەمانە پێوەی پابەندبن. دڵنیا کراوینەتەوە لە ئاستی باڵا لە سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان، سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران، وەزارەتی سامانە سروشتییەکان، ئێمە دەزانین کێشەی دارایی هەیە، ئەگەر مانگێکیش دوا بکەوێت تێدەگەین، بەڵام لە عێراق دوو ساڵ‌و نیو زیاترە پارەی پترۆدۆلارمان وەرنەگرتووە.

لە ڕووی ئیدارییەوە کێشەیەکی زۆرمان لەگەڵ بەغدا هەیە. خەڵکی کەرکووك پێیخۆشە پەیوەندی لەگەڵ بەغداش هەبێت، ئێمەش دەمانەوێت. لە هەمانکاتدا هەموو پێکهاتەکانی کەرکووکیش ئەو قەناعەتەیان لەلا دروست بووە کە پێویستە پەیوەندی باش لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا هەبێت، چونکە ئێستا پێشمەرگە کەرکوك دەپارێزێ.

من باوەڕم بەوە هەیە لامەرکەزییەت هەبێ، پارێزگاکان خۆیان ئیدارەی خۆیان بکەن، جگە لە چەند شتێکی سیادی.

بەغدا ئێستاش بە بڕیارەکانی ئەنجوومەنی قیادەی شۆڕشی سەردەمی بەعس کاردەکات. هەشت وەزارەت لە بەغدا بڕیاریان داوە دەسەڵاتەکانیان بگوازرێتەوە بۆ کەرکووك، بەڵام ئەنجوومەنی وەزیران بەبیانووی ئەوەی لە کەرکووك هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی پارێزگا نەکراوە، نایکات. دامەزراندن لە کەرکووك بە تایبەتی بۆ پێکهاتەی کورد تەقریبەن نییە. ئێمە لە ئەنجوومەنی پارێزگا بڕیارێکمان هەیە ئەوەی ناوی لە سەرژمێریی ١٩٥٧دا نەبێت لە کەرکووك دانەمەزرێ، ئێمە کە ڕێگە لە دامەزراندنی ئەو کەسانە دەگرین، بەغدا یەکسەر بەڕێوەبەرەکان بانگ دەکات‌و سزایان دەدات، بۆ نموونە ساڵی ٢٠١٣ نزیکەی ١٠٠٠ مامۆستا دامەزرێنران کوردو تورکمانی تێدا نەبوو. بۆ بودجەو پارە ئێمە لەژێر ڕەحمەتی بەغداین، ئەمساڵ دینارێکمان لە بەغداوە بۆ نەهاتووە. ئێمە ناتوانین بەو شێوەیە بەردەوام بین.

نەخێر کاردانەوە نییە، ئەوە ئەزموونە. کورد کە چووەتە بەغداو بەشداری لە دارشتنی دەستوور کردووە بۆ ئەوەی سیستمێکی فیدراڵی دروست ببێ. بەسرە داوای هەرێمی سەربەخۆ دەکات، ڕێگەی پێنادات. سەڵاحەددین‌و ئەنبارو مووسڵ داوایان کرد ڕێگەی پێنەدان.

ئێمە پشت بە خەڵکی کەرکووك دەبەستین، چونکە ئەگەر خەڵکی کەرکووك دەنگی لەسەر نەدات، هەرچی حیزب

ولایەن و هەرێمت لەگەڵ بێت ناکرێت. با باسی واقیعەکەش بکەین، ١٢ ساڵە ماددەی ١٤٠ هەیە جێبەجێ نەکراوە، ئەو خەڵکەی گەڕاوەتەوە ٢٠٠ مەتر زەوییەکەی لەسەر تاپۆ نەکراوە، ئەوەی لێرە بووە بەقەدەر ئاوارەکە پارەی وەرگرتووەو نەگەڕاوەتەوە. ئەو زەویيانەی پێویست بوو بۆ کوردو تورکمان بگەڕێتەوە کاری لەسەر نەکراوە.

بەبڕوای من دوورخستنەوەی بەغدا لە کەرکوك، کەرکوك نزیکتر دەکاتەوە لە هەرێمی کوردستان. لەلای من کەرکوك کوردستانە. من حەز دەکەم ئەمڕۆ کەرکوك بگەڕێتەوە سەر هەرێمی کوردستان، بەڵام ئایا دەکرێت؟

زۆر قسەم لەگەڵ لایەنەکان کردووە. قسەم لەگەڵ برادەرانی خۆمان کردووە، لەگەڵ ئەمریکا، یوئێن، یەکێتیی ئەورووپا، تورکیا، تەنانەت لەگەڵ ئێرانیش. ئەگەر ئەمڕۆ تۆ بتەوێت کەرکوك بگەڕێنیتەوە سەر هەرێمی کوردستان، پشتیوانیت نییە. پشتیوانی دەبێت. ئەگەر ئەو ڕاستییە تێبگەن کە ئەمڕۆ کەرکووکە بە چ شێوەیەك بەناوی دەستووروو یاساوە دیمۆگرافییەکەی دەگۆڕێت، ئەو مامەڵەی بەغدا لەگەڵ کەرکووك دەیکات. قەناعەت دەهێنن کەرکووك دووربخرێتەوە لە بەغدا. قەناعەتم پێهێناون، بەڵام ناوی هەموو خەڵك نابەم. تۆ ناتوانی قەناعەت بەهەموو کەسێك بێنی، گرنگ ئەوەیە زۆربەی خەڵك و لایەنە سیاسییەکانت لەگەڵ بێ. خەڵکیش هەیە دەیەوێ تۆ هەر لەگەڵ بەغدا بمێنیتەوە. خەڵك هەیە حەز دەکات بە یەکجاری بیکەیتە هەرێمێکی سەربەخۆ. بۆچوونی ئێمە ئەوەیە بتوانین خزمەتی خەڵکی کەرکووك بکەین، بتوانین بودجەی بۆ دابین بکەین. بتوانین خەڵکەکەی دابمەزرێنین. بەو شێوەیەی کە لەگەڵ بەغداین، ڕێگەمان لێگیراوە. ئێستا لەنێو پێکهاتەکانی کەرکووك بۆچوونێکی بەهێز هەیە کە ببێتە هەرێمێکی سەربەخۆ بۆ ماوەی سێ یان چوار ساڵ، لەو چوار ساڵەدا تۆ نموونەیەکی باش نیشانی خەڵکی شاری کەرکووك بدەی.

لە هەمانکاتیشدا با هەرێمی کوردستانیش بۆچوونی خۆی بخاتە ڕوو، کە بیەوێ کەرکووك بێتە نێو هەرێمی کوردستان، لە پەرلەمانی کوردستان وەزعی عەرەب، تورکمان و کلدوئاشووری چۆن دەبێ؟. بەشدارییان لە حکومەت چۆن دەبێت؟. ئەوانە بکات بە یاسایەکە. دوای چوار ساڵە ڕیفراندۆم بۆ خەڵکی کەرکووك دەکەی: دەتەوێ بمێنیتەوە وەك هەرێمێکی سەربەخۆ، یان ببێ بە بەشێك لە هەرێمی کوردستان؟ بوونی لەگەڵ هەرێمی کوردستان دەبێت حاڵەتێکی تایبەتی بدرێتێ.

ئێمە تازە دەستمان بە پرۆژەکە کردووە، ئێمە لەگەڵ سەرۆکایەتی هەرێم، حکومەت، پەرلەمان و حیزبەکان قسە دەکەین.

ئێمە لە تورکیا بووین، کاك نێچیرڤان بارزانی و کاك قوبادیش لەوێ بوون، لەگەڵ بەڕێز ئەحمەد داود ئۆغلو کۆبوونەوەمان هەبوو، دواتر لەگەڵ بەڕێز ئەردۆغان، ئەوان بە ئاشکرا داوایان دەکرد کە کەرکووك ببێتە هەرێمێکی سەربەخۆ. سەبارەت بە ئەمریکا و یوئێن و یەکێتیی ئەورووپا هەتا بەغداش نارازیبوونم لەسەر ئەو تەرحە نەبینیوە. باسیش کراوە کەسیش نەبووە دژی بێت. داوام کرد، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.

ئایدیای بە هەرێمکردنی کەرکوك بۆ ٣ – ٤ ساڵ، ئایدیای خۆمەو هیوادارم بیفرۆشم بە خەڵکی کەرکووك، بە ئەنجوومەنی پارێزگاو حیزبەکان لە کوردستان. چونکە ئەوە تاکە ڕێگەیە تۆ بتوانی ماف خەڵکی کەرکووك بپارێزیو بتوانی خزمەتیان بکەی.

کاك مەسعود من کە قسەم لەگەڵی کردووە، دەڵێت چۆن حوکمی دەکەی، کێ حوکمی دەکات، ئەوە گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە ناسنامە کوردستانییەکەی کەرکووك بمێنێ.

ئەو قسەی ململانێی نێو حیزبەکانەو باوەڕ ناکەم لە نێو سەرکردایەتی سیاسی کوردستان بۆچوونێکی وا هەبێت.

یەکلا ناتوانێت بڕیاری لەسەر بدات، دەبێ لەگەڵ بەغداو هەرێمی کوردستان هەوڵبدەین لەیەکدی نزیك ببینەوە. بەداخەوە ئەوان ئەگەر کێشەیەکیان هەبێت دێن داوا لە ئێمە دەکەن یارمەتییان بدەین، جا چ هەرێمی کوردستان یان بەغدا، زیاتر بەغداش. بەڵام کە کێشە نییە تەماشا دەکەی بەغدا بە ئارەزووی خۆی خەڵك دەنێرێ.

هەر لەو ماوەیەدا ٥٥٠ کەسی دامەزراندبوو هەر خەڵکی کەرکووکی تێدا نەبوو. ئەوان کە کێشەیان نەبێ لە هیچ شتێك بەشداریمان پێناکەن.

دەربارەی ڕاکێشانی بۆری نەوت لە ئێرانەوە، کوا بۆری لە کوێ هەیە، من ئاگام لە وردەکارییەکان نییە لە ڕووی عەمەلییەوە تاوەکو بۆری دروست دەکەی دوو ساڵت دەوێت. وابزانم خەڵك هەیە باسی کردووە. من بە عەمەلی نابینم. تەرحی خەڵکی نێو یەکێتی و نێو پارتیشە.

یەکێك لە هەڵەکانی کوردستان ئەوەیە کە زۆر شت کراوە بەشتی حیزب. بۆچی حیزب بڕیار لەسەر نەوت بدات؟. دەبێ ئەم بڕیارانە حکومەت بیدات.

جارێ حیزب بڕیاریش بدات ناتوانێت جێبەجێی بکات. نەوتی کەرکوك سێ چوار لایەن دەیەوێ مامەڵەی لەگەڵ بکات. تۆ ئەوە یەکێتیشت هێنایە نێو بابەتەکە، هەرچەندە بە ئینسافەوە دەیڵێم قەت لە نێو یەکێتیدا باسی ئەو بابەتە نەکراوە، بەڵام ئەو قسانە لەنێو خەڵکدا دەکرێت. لەلایەك تۆ بەغدات هەیە، لەلایەك هەرێمت هەیە، دەبێ ئەمە بەرێکەوتن بکرێ.

بەڵام من لێرەدا یەك شت دەڵێم، هەر بڕیارێك لە بارەی هەناردەی نەوتی کەرکووك لە ڕێگەی ئێرانەوە بدرێ، دەبێ ڕەچاوی دوو شت بکرێ، یەکەم: لایەنی ئەمنی بپارێزرێت، دووەم: جەدوا ئابوورییەکەی چەندە. ئەگەر ئەم دوو لایەنە دەکرێ، با بکرێ.

زۆر ئاساییە دووانیشت هەبێ، بەڵام ئەمڕۆ تۆ یەکێکت هەیە، تۆ تا بۆرییەکی دیکە دروست دەکەی ئەم نەوتەی کەرکووك ناڕواتە دەرەوە لەبەر ئەوەی چاوەڕێی دروستکردنی بۆریی ئێران دەکەین، ئەمە نابێت. عەمەلیش نییە، ئەمە هەمووی قسەیە، کاردانەوەیە و لەکێشە حیزبییەکانەوە هاتووە.

تازە جەماعەتێك لە وەزارەتی نەوتی عێراق لێرە بوون، چووبوونە هەرێمی کوردستانیش. قسەیەك هەیە بەشێوەیەك ڕێکبکەون دەست بە هەناردەکردنی نەوتەکە بکەنەوە.

*** مەترسییەکانی بە هەرێمکردنی کەرکوك**

عارف قوربانی

ئەگەر کورد پرۆژەیەك پێشکەش بکات بۆ جۆری مامەڵەو دیاریکردنی مافو ئیمتیازاتی پێکهاتەکانی کەرکوك، تەنانەت ئەگەر کانتۆنی ئیداری تایبەت بە پێکهاتەکانیش دروست بکات لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا، یاخود بە رێککەوتنی سیاسی ئەگەر کورد زۆرترین تەنازولاتی ئیداریو سیاسی بکات لەوەی شارەکە هەمووشی بە دەست پێکهاتەکانی ترەوە بن لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا، زۆر لەوە باشترە ئەگەر هەموو ئیدارەی کەرکوك بە دەستی کوردیشەوە بێت، کاتێ کەرکوك نەگەڕابێتەوە سەر هەرێمی کوردستان.

ئەمەش بەو واتایەی کورد کێشەی لەسەر ناسنامەی شارەکەیە نەك ئیدارەی شارەکەو پۆستو کورسی دامودەزگاکانی.

لە کاتێکدا هەموو ئیدارەی کەرکوك بدەن بە کورد ئەگەر شارەکە نەخرابێتەوە ناو چوارچێوەی هەرێمی کوردستان مەترسییەکی گەورەیە. ئەی چ جای ئەوەی کێشە جۆراوجۆرەکانی ئێستای کەرکوکەوە ئەگەر کەرکوك بکرێت بە هەرێمێکی سەربەخۆ عەرەبو تورکمان دەبنە بڕیار بەدەستی رەهای شارەکەو چارەنووسی کوردەکانی کەرکوك بۆ داهاتوویەکی دوور لە چارەنووسی کوردەکانی بەغدا باشتر نابێت.

ئەوەش بەهۆی بوونی چەند رێککەوتنێکی پێشووتری پێکهاتەکانی ناو ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك بە ناوبژیوانیو ئامادەبوونی نوێنەرانی ئەمریکاو بەریتانیاو نەتەوە یەکگرتووەکان، هەر لە رێککەوتنی ٢ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٧ نێوان کوتلەی کوردیو کوتلەی عەرەبی لە ئەنجوومەنی پارێزگا، کە پێشتر کوتلەی عەرەبەکان لە کاری ئەنجوومەنی پارێزگا کشابوونەوەو چەند مەرجێکیان هەبوو بۆ گەڕانەوە بۆ ناو ئەنجوومەن، لە رێککەوتنی ٢ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٧ توانیان هەموو مەرجەکانیان بسەپێنن، گەرچی لەسەر ئەرزی واقیع کار بەو رێککەوتنەو مەرجەکانیان نەکرا، بەڵام وەك بەڵگەیەك تەوسیقکراو لە دەرفەتێکدا توانایان هەبێت ئەوکات دەیسەپێنن بەسەر کورددا.

هەروەها رێککەوتنی (بەحر ئەلمەیت)ی نێوان هەرسێ کوتلەی تورکمانیو عەرەبیو کوردی لە ساڵی (٢٠٠٨). رێککەوتنی (ئیرلەندا) لەنێوان هەر چوار پێکاتەکەی کەرکوك لە ساڵی (٢٠٠٨). ناوەرۆکی ئەو سێ رێککەوتنە ئەوەیە کە مافی بەرێوەبردنی شارەکە بە یەکسانی لە نێوان پێکهاتەکان دیاریدەکاتو ئاسایشو پارێزگاریکردن لە کەرکوك بە هێزێکی تایبەتمەندی پێکهاتوو لە هەموو لایەنەکان دەسپێردرێت.

رەخساندنی هەر زەمینەیەك کە دواجار ئەم رێککەوتنانە بکاتە ئەمری واقیع لە کەرکوك، بۆ داهاتوو مەترسییەکانی بەقەدەر رێککەوتنی جەزائیر کارەساتو کاریگەری خراپی لێدەکەوێتەوە.

ئەو رێککەوتنانە بۆ حاڵەتێکی وەك ئێستای کەرکوك مایەی مەترسییەکە بەهۆی لێککەوتەکانی شەڕی داعشەوە کورد هەیمەنەی زاڵە لە کەرکوك، جا ئەگەر کەرکوك بکرێتە هەرێمێکی سەربەخۆ ناوەرۆکی ئەو رێککەوتنانە دەبێتە مانیفێستی پرۆسەی سیاسیو تیایدا کورد ٣٢٪ی شارەکەی بەردەکەوێت. بارزانی لە ساڵی ٤٧ بە نیوەی رازی نەبوو. !

بۆیە ئەگەر لە هەرحاڵەتێکی ئاساییدا کاتێ هەر هەژدە پارێزگاکەی عێراق هەرێمی سەربەخۆ بووایان، رەنگە ئەو کات کورد بیتوانیایا کەرکوکیش وەك پارێزگاکانی تری هەرێمی کوردستان تەماشا بکات، بەڵام بەهۆی قوڵبوونەوەی کێشەکانیو بەهۆی رێککەوتنی ٢ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٧ەوە ئەگەر ئێستا هەموو پارێزگاکانی عێراقیش بکرێن بە هەرێمی جیاجیا، ئەوە بۆ کەرکوك مەترسییەکانی گەورەیە.

بە تایبەتیش دوای ئەوەی نەخشەی رێگایەکی دەستووری بۆ چارەسەری کێشەکانی دیاریکرا وەك لە مادەی ١٤٠ی دەستووری هەمیشەیی عێراقدا هاتووە. بۆیە هەر جۆرە قسەکردنێك وەك تەرح و بیرۆکە بۆ مەسەلەی بە هەرێمکردنی کەرکوك، بەدەر لەو مەترسییانەی تری. مەترسی گەورە دەخاتەسەر شەرعییەتە دەستوورییەکەی کە ماف بە کورد دەدات کەرکوك بخاتەوە سەر هەرێمی کوردستان. پێشنیازی بە هەرێمکردنی کەرکوك بیانوو دەداتە نەیارانی کوردو کەرکوك کە ئەو شەرعییەتە دەستوورییە فەرامۆش بکەن، بەوەش کێشەکانی کەرکوك ئاڵۆزتر دەبنو هەنگاوەکانی چارەسەر دوورتر دەکەونەوە.

بەتایبەتیش کە ئێمە جگە لە پارێزگای کەرکوك، ژمارەیەك قەزاو ناحییەی ترمان هەن، کە بایەخیان بۆ کوردو کوردستان لە کەرکوك کەمتر نییە، لە رووی ژمارەی دانیشتووانو پانتایی جوگرافیشەوە لە کەرکوك بەرفراوانترن، بە هەرێمکردنی کەرکوك چارەنووسی ئەو ناوچانەش دەخاتە مەترسییەوە.

ئومێدی ئەوە دەخوازم ئەو کوتلە سیاسیو تاكو تەرا روناکبیرو سیاسیانەی کەرکوك کە ماوەیەکە لە کاریگەری ئەجندای خەڵکانی تر، بیر لەو بیرۆکەیە دەکەنەوە، هەڵوەستە لە ئاستی ئەو مەترسییانە بکەنو مێشكو دڵو دەروونیان لەو بیرکردنەوانە پاك بکەنەوە. چونکە ئەگەر بە تەنها باسکردنیش بێت، ئەوە لەلایەك ئەو مەیلە کوردییە دەکوژێت کە کار بۆ گەڕانەوەی کەرکوك دەکاتو لە بەرانبەریشدا بەرەی نەیارەکانی گەڕانەوەی کەرکوك بەهێزتر دەکات.

بەدرێژایی مێژووی رابردوو هیچ سەرکردەیەکی کورد، هیچ روناکبیرو لێکۆڵەرەوەو پسپۆڕو شارەزایەکی ئەم میللەتە جورئەتی ئەوەی نەکردووە باس لە بیرۆکەیەك بکات کە کەرکوکی خستبێتە دەرەوەی کوردستانەوە، ئەگەر تەنها دروشمو خیتابیش بووبێت، جۆرێك گوتاری نەتەوەیی یەکگرتوو بە درێژایی مێژوو لە دەستپێکردنو سەرهەڵدانی کێشەی کەرکوکەوە درێژەیی هەبووەو ئەوەندەش لەسەر تاکی کورد رەنگی داوەتەوە، کوردێك لە ئامەدو مەهابادو قامیشلۆ وە تا کوردێکی کەرکوك یەك بیرکردنەوەو

تێڕوانینیان هەبووە بۆ کەرکوك، کە ئەویش ئەوە بووە کەرکوك، ڕەمزو ناسنامەی کوردستانە. ئەمە خاڵی هەرە گەشی هاوهەڵوێستی و گوتاری هاوبەش و نەتەوەیی گەلی کورد بووە لە ڕابردووەوە تا ئێستا.

لەبەر ئەوەی کەرکوك بووەتە پێناسەی نەتەوەیی و ناسنامەی کێشەی کورد، بۆیە ئەگەر کەسێك باوەڕی بە چارەسەری کێشەی کەرکوك و سەرخستنی پرۆژەی سیاسی کوردیش نەبووبێت، جورئەتی ئەوەی نەکردووە بیر لە هیچ ڕێگاچارە، یاخود تەرحێ بەدیلێکی تر بکاتەوە. ئەگەر لە ڕابردوودا خەڵکانێك هەڵوێستێکی لەو جۆرەیان دەربڕیایا کە کەرکوك تایبەتمەندی وەربگرێت ولە دەرەوەی هەرێمی کوردستان بمێنێتەوە، بەدڵنیاییەوە ترسناکترین کاریگەری دەبوو لەسەر ئەو بیروباوەڕە پتەوو گشتییەی گەلی کورد لەسەر کەرکوك. بۆیە لە ئێستادا قسەکردن لەسەر بە هەرێمکردنی کەرکوك بەدەر لە مەترسییەکانی تری سیاسی و دیمۆگرافی، خراپترین کاریگەری لەسەر بیروباوەڕو ئومێدو خواست و داواکاری کورد دەبێت لە داواکردنەوەی کەرکوك دا.

لە ڕابردوودا کورد نەیتوانیوە کەرکوك وەربگرێتەوە، نەیتوانیوە کێشەکەی چارەسەر بکات، بەڵام لە خراپترین حاڵەتی کورددا کە بە چەکی کیمیایی مامەڵەی لەگەڵ کراوەو ئەنفال کراوین و تووشی کۆڕەو هاتووین، لەو کاتانەشدا هیچ کوردێك باوەڕی لەق نەبووە بەوەی کە ڕۆژێك دێت دەگەڕێینەوە بۆ کەرکوك لەو کاتە ناسك و هەستیارانەشدا هەمیشە باوەڕە گشتییەکە زاڵبووە بەوەی کەرکوك موڵکی کوردستانە.

لە ئێستاشدا هیچ کەسمان پەیام و موژدەیەکمان پێ نییە بڵێین لە فڵانە وادەی دیاریکراودا کێشەکانی کەرکوك چارەسەر دەبن و کەرکوك دەگەڕێتەوە سەر هەرێمی کوردستان، بەڵام دڵنیاین لەوەی ئەگەر ئەم کێشەیەی کەرکوك دەیان و سەدان ساڵی تریش درێژە بکێشێ، بەرەی داکۆکیکردن لەسەر کەرکوك و کوردستانییەتی ئەم ناوچەیە تا دێت بەتینترو فراوانتر دەبێ.

بەڵام دەبێ چاومان ئەو ڕاستییەش ببینێ و هەست بەو مەترسیانەش بکەین کە خواستێکی لەو جۆرە (بەهەرێمکردنی کەرکوك)، بۆ داهاتوو بیروباوەڕی خەبات بۆ ئەم شارە لاواز دەکات. ئەو باوەڕە دەروونییەی کوردی کەرکوك کە هەمیشە بە هیوای کوردستانەوە ڕۆژ دەدەنە دەم یەك، تووشی چی داڕووخانێك دەبێت و ئەو ئامادەییە نەتەوەیەی کوردی کەرکوك بۆ بەرگری لە شارەکە بەکوێ دەکات و وردە وردە کەسێتی نەتەوەیی تێکدەشکێت و دواجار هیچ هێزێك نییە بتوانێ ئەو تێکشکانە دەروونییە ڕاست بکاتەوە.

بۆیە وەك چۆن لە ڕابردووی دوورو نزیکی ئێمەدا مەسەلەی کەرکوك هێماو ناسنامەمان بووەو مەسەلەی دەستبەردار بوون لەم شارە هێڵی سوورو خیانەتی نیشتمانی بووە. هەق وایە ختوکەدانی خەڵك و وروژاندنی ئیحساسی کەرکوکییەکانیش بۆ بە هەرێمکردنی کەرکوك بەهەمان تێڕوانینەوە تەماشا بکرێت. تا هیچ کەسێك جورئەتی ئەوە نەکات بیر لە هیچ بیرۆکەیەکی لەو جۆرە بکاتەوە، چونکە تەنها باسکردنی ئەم مەسەلەیەش کاریگەری ترسناکی هەیەو ئەگەر ڕاستەخۆ لە ئێستاشدا ڕەنگ نەداتەوە، لە دوور مەودادا دەبێتە مەترسییەکی گەورە لەسەر پرۆژەی کوردی بۆ چارەسەری کێشەی کەرکوك.

کەسێکی وەك مام جەلال بەووردی لەم هاوکێشەیە تێگەیشتبوو، بۆیە بێ گەڕانەوە بۆ وەرگرتنی ڕای هیچ کەسێك بیرۆکەی دەوڵەتی کوردی بێ کەرکوکی ڕەتکردەوە. ئەویش کاتێك لە ساڵی (١٩٩٥) وەفیق سامەڕائی ڕیزەکانی ڕژێمی بەعسی بەجێهێشت و پەیوەندی کرد بە ئۆپۆزسیۆنی عێراقییەوە، لەلایەن ئەمریکا و بەشێك لە هاوپەیمانەکانی، بە پشتبەستن بە سامەڕائی و ئەو بەرپرسە سەربازییانەی ناو سوپا کە پەیوەندییان بە ئۆپۆزسیۆنەوە هەبوو پرۆژەی کودەتایەکی سەربازی پێشکەشکرا تا لەو ڕێگەیەوە ڕژێمەکەی سەدام بگۆڕن. داوا لە یەکێتیی نیشتمانی کوردستان کرا بەشداری ئەو پرۆژەیە بێت کە لەو کاتەدا یەکێتیی خاوەن بەهێزترین هێزی چەکدار بوو لەسەر ئەرزی واقیعی عێراق، یەکێتیی بەمەرجی ئەوە ڕازی بوو کە هێزی پێشمەرگە کەرکوك کۆنترۆڵ بکات و چووە ناو ئەو بەرەیەوە. سەدام حوسێن پێش دەستپێکردنی پلانەکە پێی دەزانێت و ئەشزانێ بەشداری کورد چی کاریگەرییەکی دەبێت، بۆیە نامەیەك بۆ مام جەلال دەنوسێت و داوا لەمام جەلال دەکات کە نەچنە ناو ئەو پیلانەوەو بەشداری لەو بەنامەیە نەکەن، ئەو دان بەوەیا دەنێت کە پرسی کورد جیایە لەوان ئامادەیە بۆ چارەسەری کێشەی کورد ڕەزامەندی نیشان بدات بەو سنوورە جوگرافیی و ئیدارییەی هەرێمەوە دەوڵەتی کوردی ڕابگەیەنن و عێراق یەکەم دەوڵەت دەبێت لە نەتەوەیەککرتووەکان دانی پێدابنێت. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە کورد لەژێر ئابلوقەی ئابووری جیهان لەسەر عێراق و عێراق لەسەر هەرێمی کوردستان دەینالاند، پەیوەندییەکانی ناوخۆش لە دۆخێکی خراپی شەڕی براکوژیەدا بوو. مام جەلال لەو دۆخە دژوارە، ئامادە نەبوو دەوڵەتی کوردی بەبێ کەرکوك قبوڵ بکات و بە خێر وەڵامی سەدام دەداتەوەو تەئکیدی کردووەتەوە کە کەرکوك خاکی کوردستانەو دەبێت بەشێك لە هەرێمی کوردستان. ئایا ئێستا مایەی شەرمەزاری نییە کورد بەوە ڕازی بێت کەرکوك بە پاساوێکی نابەجێ و ناعەقڵانی چوارچێوەیەکی بدرێتێ کە بۆ هەمیشە لە کوردستانی دابڕێت.

دوای شەڕی یەکەمی جیهانی و شکستی خەلافەتی عوسمانی، بەهۆی دابەشکردنی ناوچەکە لەنێوان وڵاتە سەرکەوتووەکاندا، لە کێشمەکێشی نێوان بەریتانیا و تورکیا و عێراقی تازە دامەزراو، ئەم بەشەی کوردستان (ویلایەتی موسڵ) بەبێ ویستی دانیشتووانەکەی لکێندرا بە عێراقەوە. کاتێ وەفدی کۆمەڵەی گەلان لە ساڵی (١٩٢٤) هاتن و ڕاپرسیان لەناو دانیشتووانی ویلایەتەکە ئەنجام دا، بەشێ هەرە زۆری خەڵکی کوردستان دژی لکاندنیان بوون بە عێراقەوەو نەیاندەویست لەگەڵ عەرەب بژین، بەڵام گوێ بە خواستی خەڵکەکەی نەدراو بڕیاری کۆمەڵەی گەلان پێچەوانەی خواستی دانیشتوانەی دەرچوو، لە ساڵی

(١٩٢٦) بڕیارەکە لە قۆناغی جێبەجێکردنەوەو لەدوای ئەو بڕیارەی کۆمەڵەی گەلانیشەوە تا ئێستا کورد لەم بەشەی کوردستانی بە عێراقەوە لکێندراو زوڵمی لێدەکرێت. هەرچەندە بەدرێژایی ئەو مێژووە سەرباری چەوساندنەوەی کوردو بێبەشکردنی لە مافەکانی‌و هەوڵدانی ڕژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق بۆ توانەوەی کورد لە بۆتەی نەتەوەی عەرەبدا، گەلی کورد لە دروشمی خەبات‌و تێکۆشانیدا هیچ کات دروشمی جوداخوازی نەبووەو هەمیشە داوای مافەکانی کوردی لە چوارچێوەی عێراقدا کردووە.

ئەگەرچی لە ناخی هەر کوردێکدا خواستێکی ڕەوا هەبووە بۆ ئەوەی وەك میللەتانی دونیا خاوەن کیانی سەربەخۆیی خۆمان بین، بەڵام واقیعی زاڵ لەبەرچاو گیراوەو بەزۆریش بووبێت خۆمان بە عێراقەوە هەڵواسیوە.

بەڵام مانەوەی کورد لە عێراق، یان جیابوونەوەمان، پەیوەندی بە هەلومەرجی سیاسیی ناوخۆیی عێراق‌و ناوچەکەو جیهانەوە هەیە. مەرج نییە کورد تا سەر هەر هەڵگری بەدیهێنانی خواستەکانی بێت لە چوارچێوەی عێراقدا، بەتایبەتیش کە هیچ زەمانێك نییە لەناو کۆمەڵگەی عەرەبی عەقڵییەتی شۆڤێنی‌و دڕندەی وەك سەدام دروست نابێتەوە.!

خەسڵەتی کۆمەڵگەی عەرەبی بە ئێمە ناگۆڕدرێت، ئەوتانێ لە هەزارەی سێیەمدا دوای دادگاییکردنی سەدام‌و ئیعدامکردنی کە دەبوو ببێتە پەند بۆ هەموو کۆمەڵگەی عەرەبی، نموونەی وەك بەشیرو ئەسەدو قەزافی‌و مالکی، سەرهەڵدەداتەوە. کە ئەمە ئاماژەی ترسناکە بۆ پێکەوەژیان‌و قبووڵکردنی جیاوازی لای ئەو کۆمەڵگایە.

بۆیە دەبێت کورد ئەو ڕێگایانەی بەرەو ڕزگاری دەبەن لەبەردەم خۆی تەسکیان نەکاتەوە.

کەرکوك یەکێکە لە کۆڵەکە بنەڕەتییەکانی پایەی کیانی سەربەخۆی کورد لە داهاتوودا، بەڵام ڕازی بوونی کورد بە جیاکردنەوەی‌و بە هەرێمکردنی. بۆ یەکجاری دەروازەکانی ڕزگار نەتەوەییمان بە ڕوودا دادەخات. واتا گرتنەبەری هەر ڕێگەیەك بۆ چارەسەری کێشەی کەرکوك، لە بنەڕەتدا لێدانە لە پرۆژەی سەربەخۆیی کوردستان‌و تێکشکاندنی خەباتی ناسیۆنالیستی کورد.

ئەوانەی لە ئێستادا قسە لەسەر بە هەرێمکردنی کەرکوك دەکەن، یاخود ختوکەی خەڵکی کەرکوك دەدەن بۆ خواستێکی لەو جۆرە پێدەچێت لە کاریگەرییە ترسناکەکانی ئەو نەخشەیە بۆ داهاتووی کورد تێنەگەیشتن، بۆیە ئەرکێکی نیشتمانی‌و نەتەوایەتی سەرشانی ڕووناکبیران‌و خەباتکارانی ئەم قۆناغەیە، زوو سەرکردایەتی سیاسی گەلی کورد لەو مەترسییەو کاریگەرییە دوور مەوداکانی بۆ سەرگەلی کوردستان ئاگادار بکەینەوەو ئەوانەش بە ئاگا بێنینەوە کە دەیانەوەی ئاراستەی خواستی کەرکوکییەکان بەو ئاقارەدا بەرن.

هیواخوازم ئەم بابەتە چووبێتە چوارچێوەی ئەو خزمەتەوەو توانیبێتم، بێ ناوهێنانیان ئەوانەی لە پشتی پرۆژەیەکی لەم جۆرە بوون لە مەترسییەکانی تێگەیشتبن‌و دڵنیابن لەوەی بە هەرێمکردنی کەرکوك نەك خزمەت بە گەلی کورد دانیشتووانی کەرکوك ناکات، بەڵکو دەبێتە هۆی زڕاندنی خەون‌و ئومێدی نەوەکانی داهاتوویشمان‌و بۆ هەتاهەتایە کورد لە پاشکۆییدا دەهێڵێتەوە. کە مانەوەمان لەم چوارچێوە جوگرافییەو ژیانمان لەگەڵ ئەم پێکهاتەیەی ئێستای عێراقدا، هیچ مسۆگەرییەکمان ناداتێ بۆ بەختەوەریی بە نەوەکانی داهاتوومان. ئێمە لەسەر ڕووداوە تاڵەکانی ڕابردوو بەرپرسیارێتی دەخەینە ئەستۆی نەیارەکانمان‌و ئەوەشی پەیوەندی بە خۆمانەوە هەبێ دەیخەینە ئەستۆی باوباپیرانمان. بۆ ئەوەی نەوەکانی ئێمەش هەمان ڕەخنەمان ئاراستە نەکەن‌و مێژوو دووبارە نەبێتەوە، دەبێ ئێمە بەدوای ڕێگاچارەی ڕیشەییدا بگەڕێین. بێدەنگیمان لە ئاستی ئەوەی کەرکوك بکەن بە هەرێمێکی سەربەخۆ، نەك لە ڕێگاچارەکان نزیکمان ناکاتەوە، بەڵکو قفڵ لە دەرگای بەختەوەری ئێستای ئێمەو ئایندەی نەوەکانیشمان دەدات.

هەروەك هیواخوازیشم بووبێتە هۆی ڕاچەنینی سەرکردایەتی سیاسی کوردستانیش کە ئێستا لەسەر ئەرزی واقیعی کەرکوك خەڵکانێك هەن کار بەو ئاراستەیە دەکەن‌و ئەرکی سەرکردایەتی سیاسی کوردستانە بەر بەو ڕەوتە پڕ مەترسییە ڕاگرێت.

بیرکردنەوە لە چارەسەری کێشەی کەرکوك پێش ئەوەی بیرکردنەوەبێت لە ئایندە، پێویستە لەبەرچاوگرتنی مێژووش بێت، هەروەك لە بنەڕەتیشدا ئەم بابەتە بەرپرسیارێتییەکی مێژووییە. مەلا مستەفاو سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلوول ئەگەر بەو چارەسەرە ڕازی بوایان کەلە نەخشەی ڕێکەی پرۆژەی ١١ی ئازارو ئەنجامی ٤ ساڵ گفتوگۆ لەگەڵ سەدام‌و سەرکردایەتی بەعس پێی گەیشتن، ئەوە ئەنجامی شۆڕشەکە بەو جۆرە نەدەبوو وە کورد تووشی هەرەسی ساڵی ١٩٧٥ نەدەهات.

هەندێ ڕووداو هەن ئاراستەی مێژوو دەگۆڕن، کەسمان بە دیاریکراوی نایزانین بڵێین ئێستا چۆن دەبوو، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەگەر لە ١٩٤٧ کورد بەو شێوازە لە چارەسەری کەرکوك ڕازی بوایا ئێستا عێراق‌و کوردستان دۆخێکی جیاوازتر بوو.

یاخود ئەگەر لە ناوەڕاستی هەشتاکان‌و لە گفتوگۆی نێوان یەکێتیی نیشتمانی کوردستان‌و سەرکردایەتی بەعس لە عێراق، کورد ملی بۆ قبوڵکردنی ئەو چارەسەرە بدایا کە لەدوا ساتەکانی گفتووگۆدا سەدام کردبوویە مەرج، بەدڵنیاییەوە ڕووداوەکانی دوای ئەوە بەمجۆرەی ئێستا نەدەبوون، نە هەڵەبجە ڕووی ئەداو نە ئەنفال. بەڵام دەستبەردار نەبوونی کەرکوك بەرپرسیارێتیەکی نەتەوەیی نیشتمانی ئەخلاقی سیاسی بووەو هیچ سەرکردەو حیزبێکی کوردی جورئەتی ئەوەی نەکردووە قبوڵی ئەوە بکات کەرکوك لە دەرەوەی سنووری جوگرافیای کوردستان پەسەند بکات.

تەنانەت ئەگەر بەرچاویشیان ڕوون بووبێت لەوەی خۆیان‌و میللەتەکەش دەکەونە بەردەم بەرداشی سوپا زەبەلاحەکەی عێراق، وەك ئەوەی تاریق عەزیز بە ئاشکرا وەك هەڕەشە ئەمەی بە سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان

گوتبوو كە كوردستان دەكەین بە خۆڵەمێش. لەو حاڵەتەشدا سەركردایەتی یەكێتیی ئامادەی دەستبەردار بوون لە كەركوك نەبوون‌و ئامادەی قبوڵكردنی نەتیجەی هەموو قوربانیەك بوون.

بەو هۆیانەشەوە راستە كێشەی كەركوك بە چارەسەر نەكراوی مایەوە، بەڵام سەرباری ئەو هەموو كۆمەڵكوژییانەی بەسەر میللەتەكەماندا هاتوون، كورد ماوەتەوەو هەر سووره لەسەر وەرگرتنەوەی كەركوك. ئەگەر لە هەر قۆناغێك لەو قۆناغانەی مێژوو كورد بە چارەسەرێك رازی بوایا كەركوك لە دەرەوەی كوردستان بێت، هەر وەك ئێستا كورد دەمایەوە، بەڵام ئەوەی لە دەستی دەچوو وە ماف بەسەرییەوە نەدەما كەركوك بوو. وەك چۆن بە ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی ململانێكان لەسەر نەینەوا ئەم راستیە دەبینین.

رەنگە پرسیارێكی بەجێ بێت ئەگەر بپرسین ئەی كورد تاكەی چاوەڕوانی چارەسەری كێشەی كەركوك بكات؟ راستە پێویستەو گرنگە كورد لە قۆناغێكدا بڕیارێكی ئازایانە بدات لە كۆتایی پێكهێنانی كێشەی كەركوك، بەڵام دەبێت ئەو حەقیقەتەش لەبەرچاو بگرین دەیان ساڵی تر ئەم كێشەیە بەردەوام بێت باشترە لە چارەسەرێك كە دەرهێنانی كەركوك بێت لەدەست كورد.

ئەمەی ئێستا قسەی لەبارەوە دەكرێت‌و پێدەچێت لەگەڵ ناوەندی دەسەڵات لە عێراق زۆر بە زۆر قسەی لەبارەوە كرابێت، ئەنجامەكەی لەژێر هەر ناو وپاساوێكدابێت، لەدەست دەرهێنانی كەركوكە لە دەستی كوردو رەنگە بۆ چەند ساڵێك ئامادەیی سازشبن بۆ كوردو بیانەوێ بەوە دڵنیایی بدەنە كورد پۆستەكانی ئەو هەرێمە بەشێكیان لەلایەن كوردەوە بەرێوە ببرێن. بەڵام بەدڵنیاییەوە دوای چەند ساڵێكی كەم هەموو هاوكێشەیەك ئاوەژوو دەبێتەوەو هاوشێوەی بەغدا چۆن لە ماوەی كەمتر لە دەساڵدا رەنگ‌و رووخساری شیعەی بەسەردا سەپێندرا، كەركوكیش بەهۆی بەهێزی پێگەی شیعە لە ناوەندو بەهۆی بوونی شیعە لە نێوو دوو پێكهاتەی شارەكە (عەرەب‌و توركمان)، دوای دە ساڵی تر كەركوكیش هەیمەنەی شیعەی بەسەردا دەچەسپێندرێت. بێگومان دەبێت ئەو راستییەش لەبەرچاو بگرین مانەوەی دۆخی كەركوكیش بە چارەسەرنەكراوی‌و بەم شێوەیە، ململانێكان قووڵتر دەكاتەوەو رەنگە مەینەتی تریشمان بێتەرێ. بۆیە پێویستە سەركردایەتی سیاسی كوردستان بەشێوەیەكی عەقڵانی بیر لە چارەسەری ریشەیی كێشەكەی بكاتەوە كە ئەویش تەنها بەوە دەبێت كەركوك لەناو چوارچێوەی هەرێمی كوردستاندابێت، بە زامنكردنی ماف پێكهاتەكان‌و دڵنیاییدان پێیان‌و دروستكردنی متمانەیەك كە بێ نارەزایەتی ببنە بەشێك لە هەرێمی كوردستان.

لە ئێستاشدا ئەگەر كورد كۆتایی بەو گوتارە بهێنێت كە باس لە بەهەرێمبوونی كەركوك دەكات‌و لەبری ئەوە هەڵوێستی توندو راشكاوانەی دەربڕێت كە هیچ چارەسەرێك لە دەرەوەی گەڕانەوەی كەركوك بۆ سەر هەرێمی كوردستان قبووڵ ناكات، و بیر لەوە بكاتەوە ئاراستەی بڕیاری كەركوك بخرێتە دەستی كەسانێك كە ئامانجیان گەڕانەوەی كەركوك بێت بۆ سەر هەرێمی كوردستان. ئێستا دەرفەتەكان لە هەموو كات‌و ساتێك گونجاوترن. هاتنی داعش‌و ئەو لێكەوتەو دەرئەنجامانەی لێی كەوتنەوە دۆخێكی خوڵقاند كورد بە ئاسانی بتوانێت كەركوك كۆنترۆڵ بكات‌و هیچ كاردانەوەو نارەزایەتییەكی لێنەكەوێتەوە، كە پێشتر وەك لە راپۆرتی (بێكەر هاملتن) ئاماژەی بۆ كرابوو چارەڕوانی ئەو دەكرا ئەگەر رۆژێك كورد ئەو رێگەیە بگرێتەبەر و بەهێز كۆنترۆڵی كەركوك بكات، ئەوە وەك بەرمیلی باروت كەركوك لەنێوان پێكهاتەكانی دەتەقێتەوە.

هێزی پێشمەرگەی كوردستان گیانفیدایانە دەرفەتی داعشی قۆستەوەو بۆ پارێزگاری لە كەركوك كۆنترۆڵی ناوچەكەی كردو پێكهاتەكانی كەركوكیش سوپاسگوزار بوون كە كورد لە دەستی داعش دەیانپارێزێت. ئەمە باشترین دەرفەتێكە بۆ كورد لە رووی ئیداریشەوە كەركوك ببەستێتەوە بە هەرێمی كوردستانەوە.

هەرچەندە ئێستا هەرێمی كوردستان بەدۆخێكی قەیراناویی ئابووری‌و سیاسیدا تێدەپەرێت‌و رەنگدانەوەی ئەم دۆخەش لای خەڵكی كەركوك دروستكردنی نائومێدیەكی گەورەیە بەوەی ئەگەر كەركوك بخرێتەوە سەر هەرێم ئەوە هەمان ئەو قەیرانە ئابوورییە كاریگەری دەخاتە سەر خەڵكی كەركوك. كە ئۆباڵی ئەم تێگەیشتنە هەڵەیە لە ئەستۆی میدیاكانی كوردستانە، بێ ئەوەی بیر لەوە بكرێتەوە كەركوكی دەوڵەمەند بەنەوت لە وابەستەكردنی بە هەرێمەوە نەك نابێتە هۆی ئەوەی قەیرانەكانی هەرێم بۆ كەركوك بگوێزێتەوە، بەڵكوو دەبێتە دەروازەیەك بۆ تێپەراندنی ئەم قەیرانە داراییەو رزگاركردنی هەرێمی كوردستان.

پێویستە خەڵكی كەركوك دڵنیا بكرێنەوە كە بە گەڕانەوەیان بۆ سەر هەرێم ئارامی‌و ئۆقرەیی ئابووریی‌و سیاسی زیاتر چاوەڕوانیان دەكات وەك لەوەی بەم شێوەیەی ئێستا بمێننەوە كە هەموو ئاماژەكان ئەوەمان پێدەڵێن مانەوەی كەركوك بەم جۆرە، دەكەوێتە بەر هەڵمەتی پرۆسەیەكی تری تەعریب ترسناكتر لە قۆناغەكانی رابردوو. ئەوەی دۆخەكەی راگرتووە شەری داعشە، دوای كۆتایی هاتنی داعش ئەگەر كەركوك نەخرێتە ناو چوارچێوەی هەرێمی كوردستانەوە رووبەرووی پەلاماری حەشدی شەعبی‌و لێشاوێكی تری عەرەب دەبێتەوە.

بۆیە باشتر وایە لەبری ئەو جۆرە بیرۆكەو پێشنیازانە كە دەخوازن كەركوك بكرێت بە هەرێم، پێویستە كورد هەوڵی ئەوە بدات ئەو مەترسییانە بۆ پێكهاتەی توركمان‌و كریستیانەكانی كەركوك روون بكاتەوە، وە دڵنیایی‌و دەستووریان بۆ دەستەبەر بكات تا ئەوان پشتیوانی گەڕانەوەی كەركوك بن بۆ سەر هەرێمی كوردستان. ئەمە ئەگەر تاكە بژاردەش نەبێت باشترین بژاردەكانە، چونكە كورد لەگەڵ عەرەب ناگاتە هیچ ئەنجامێك بۆ چارەسەری كێشەی كەركوك. دەبێت بە دوو ئاراستە كار لەسەر ئەوەبكات لەلایەك دڵنیایی پێكهاتەكانی تر بەدەستبهێنێت‌و لەلایەكیش ئەو ئامرازو رێگایانە بگرێتەبەر كە هەیمەنەی عەرەب لەسەر كەركوك كەم دەكاتەوە. ئەویش لە رێگەی

یاسایی و دەستووریی یان دروستکردنی دۆخێکی نائارام بۆ عەرەب یان بە دەستبەرداربوونی کورد لە بەشێك خاکی کوردستان کە دیمۆگرافیاکەی گۆڕاوە، بۆ نموونە ناردنەوەی عەرەبەکانی کەرکوك بۆ حەویجەو جیاکردنەوەی حەویجە لە کەرکوك چی بە خستنەسەر پارێزگای سلاحەدین بێت یاخوود کردنی بە پارێزگایەك.

گرنگە ئەم ووروژاندنی بەهەرێمکردنەی کەرکوك بمان ووروژێنێت، سەرکردایەتی سیاسی کوردستان، هێزە سیاسیەکانی کورد بە ئاگابێنێتەوە لە مەسەلەی کەرکوك و کۆتایی بە قۆناغی فەرامۆشکردنی ئەو پرسە بێت. دەست بەهەڵمەتێك بکرێت بۆ دڵنیاییدان بە پێکهاتەکانی تر بە تایبەتی تورکمان.

بەهۆی ئەوەی لە بنەرەتەوە پرۆژەی بەهەرێمکردنی کەرکوك بیرۆکەو پرۆژەی تورکمان و دەوڵەتی تورکیا بوو، پێویستە کورد بەرچاوی تورکمانەکان و تورکیاش لەوە روونبکاتەوە کە وەك چۆن کورد لە بەهەرێمکردنی کەرکوك زەرەرمەند دەبێت، بە هەمان ئەندازە بۆ تورکمانیش مایەی مەترسیە.

وە دەبێت بۆیان روونبکەینەوە دەستکەوتی تورکمان لە شەراکەتی لەگەڵ کورد، ئەگەر لە ئێستاشدا لە کورد زۆرتر نەبێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە لە داهاتوویەکی دوور مەودایا سودمەندی یەکەم تورکمان دەبێت. ئەویش بەهۆی ئەوەی تورکمان لە عێراق ساڵ لەدوای ساڵ لە بەردەم داڕووخانی زیاترو پەراوێز خستنی زۆرتردایە. تەنانەت نەك لە رووی رۆڵ و کاریگەریی و شەریککردنەوەیان لە دەسەڵات، بەڵکو لە پاراستنی ناسنامەو مانەوەشیدا وەك نەتەوەیەك، لە عێراق مەترسی گەورەیان لەسەرە.

ئەگەر چەند نموونەیەك لەو ئامارانە بکەین بە پێوەر بۆ دەرخستنی ئەو راستییەی وەك مەترسییەك ئاماژەمپێکرد، ئەوە بەرچاومان روونتر دەبێت لەوەی تورکمان لە عێراق لە بەردەم توانەوەدایە. لەسەر ئاستی عێراق بە گشتی و بە تایبەتیش لە کەرکوك، کە لێرەدا بە پشت بەستن بە ئامارو سەرژمێرییەکانی دەوڵەتی عێراق ئەم راستیە روونتر دەکەینەوە.

لەسەر ئاستی عێراق بە گشتی:

سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧) بە پێی بنەما زانستییەکانی سەرژمێریی باوەڕپێکراوترین سەرژمێرییە لە عێراق، بۆیە ئەوە دەکەم بە سەرەتاو بنەمای لێکدانەوەکان. لە ساڵی (١٩٥٧) تورکمان لە تەواوی عێراقدا ژمارەیان (١٣٦٨٠٦) بووە، کە بەپێی رێژەی سەدی دەکاتە (٢/١٦٪)ی ئەوکاتەی کۆی گشتی عێراق.

ساڵی (١٩٧٧) واتا بیست ساڵ دوای ئەوە ژمارەی تورکمان گەیشتۆتە (١٣٧٢١٩) کە بەپێی رێژەی سەدی دەکاتە (١/١٦٪) لە کۆی گشتی دانیشتوانی عێراق.

ساڵی (١٩٨٧)دوای دە ساڵیتر تورکمان ژمارەیان کەمیکردووە بۆ (١١٦٨٤٩) کە بەپێی رێژەی سەدی دەکاتە (٧٢. ٠٪).

ساڵی (١٩٩٧) ژمارەی تورکمان کەمیکردووە بۆ (٧٢٧٢٧) کە بەپێی رێژەی سەدەی دەکاتە (٢٨,٠٪).

ئەم ئامارانە ئەو راستییە دەسەلمێنن کە تورکمان لە عێراقدا بێ ئەوەی بەخۆیان بزان لە بەردەم هەرەشەی سڕینەوەدان، ئەمەش چەند پەیوەندی بە سیاسەتەکانی تەعریب و راگواستنەوە هەیە، زۆر لەوە زیاتر پەیوەندی بە خەسڵەتی کۆمەڵگای تورکمان خۆیانەوەیە. بەمانای ئەوەی ئەگەر لە عێراق سیاسەتی راگواستن و بەعەرەبکردن نەبوایا و هیچ جیاکارییەك لە نێوان پێکهاتەکانی عێراقدا رووی نەدابا، ئەوە رێژەی تورکمان لە عێراق ساڵ لە دوای ساڵ هەر کەمی دەکرد، رەنگە خێرایی کەمبوونەوەکە بەم جۆرەی ئێستا نەبوایا، بەڵام لە زەمەنێکی دوورتردا رێژەکانی هەر دەگەیشتە ئەو ئاستە ترسناکەو کەمتریش دەبووەوە. ئەویش بەهۆی ئەوەی عەرەبەکانی عێراق سەر بە کۆمەڵگایەکی خێڵەکی عەرەبن و رێژەی زاوزێ و گەشەکردنی خێزان لەناویاندا زۆر خێراو ناسروشتیە.! لەبەرانبەردا تورکمان پێچەوانەی ئەم خەسڵەتەی عەرەبن و کەمترین خێزانیان بواری ئەوە دەدەن لە دوو منال زیاتریان هەبێ. ئەمە وادەکات تورکمان بکەوێتە بەردەم مەترسی لەناوچوون و توانەوەوە لەناو عەرەبدا.!

لەسەر ئاستی کەرکوك:

بەپێی سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧) تورکمان لە کەرکوك ٤٤. ٢١٪ی دانیشتوانی کەرکوك بوون، واتا زیاتر لە (یەك لەسەر پێنجی) پارێزگاکەیان پێکهێناوە.

بەپێی سەرژمێریی ساڵی ١٩٧٧ رێژەی تورکمان لە کەرکوك کەم بووەتەوە بۆ ٢١. ١٦٪ لە ساڵی ١٩٨٧ زیاتر رێژەیان هاتووەتە خوارەوە وتا لە دوا سەرژمێریی عێراقدا ساڵی ١٩٩٧ رێژەی تورکمان لە کەرکوك دابەزیووە بۆ ٦,٦٦٪.

لەبەشداری پێکردنیان لە دەسەڵاتی عێراقشدا، هەمیشە فەرامۆشکراون و ئەگەر بەشداریشی پێکرابێ، بەشدارییەکی رووکەشانە بووە.! لە یەکەم کابینەی حوکمڕانی عێراقدا بە سەرۆکایەتی عەبدولرەحمان گەیلانی یەك وەزارەتێك دراوەتە تورکمان کە (عیزەت کرکولی) وەزیری مەعاریف و تەندروستی بووە. ئیتر لەوە هەمیشە تورکمان وەك پێکهاتەیەکی نکۆڵیلێکراو لە دەسەڵاتی عێراقدا هیچ بوونێکیان نەبووە، تا رووخانی سەدام ولە یەکەم پێکهاتەی ئەنجوومەنی حوکم لە عێراق بە پێداگری کورد بۆ بەشداری پێکردنی تورکمان، (سەنگول چاپوك) کرایە ئەندامی ئەنجوومەنی حوکم و لەوە و بەدواش لە هەریەك لە کابینەکانی عەللاوی و جەعفەری و مالیکی دا. تەنها یەك وەزیرێك دراوە بە تورکمان، ئەویش (جاسم محەمەد جەعفەر) وەزیری وەرزش و لاوان بووە. دواتریش سەربازی مانەوەی ئەو لە پۆستەکەی خۆی، وەزارەتی دەوڵەت بۆ کاروباری پارێزگاکان درا بە (تورهان موفتی) کە تورکمانێکی شاری کەرکوك بوو. هەرچەندە مام جەلال سەرۆك کۆماری عێراق داوایکرد لە سێ جێگرەکەی یەکێکیان بدرێتە تورکمان، بەڵام عەرەبەکانی عێراق سوننەو شیعە پێکەوە هاورابوون لەوەی نابێ ئەو پۆستە بۆ تورکمان بێت، دواتر مام جەلال پێشنیازێکی دایە پەرلەمانی عێراق دەستکاری ئەو یاسایە بکەن کە سێ جێگری بۆ سەرۆك کۆمار دیاریکردووە بیکەن بە چوار جێگر تا تورکمانێکیش بەشداری دەستەی سەرۆکایەتی بکات، بەڵام عەرەبەکان ئەوەشیان رەتکردەوە. ئەمەش ئەوە دەردەخات عەرەب

سەرباری ئەوەی هەموو هەوڵەکانیان خستۆتە گەر بۆ لێك دوورخستنەوەی کورد و تورکمان، بەڵام ئامادەنین تورکمان بکەنە شەریك لە حوکمرانی عێراقدا.
ئەی ئەگەر کاتێ تورکمان بیەوێ لەگەڵ کورد بژیو خۆی بکاتەوە لە خاوەن ئەو مافەی کە کێشەی کەرکوك بە کێشەی خۆی بزانێ شانبەشانی کورد، دەرئەنجامەکانی ئەو شەریك بوونەوەیە تورکمان دەگەیەنێتە کوێ لە بەشداریکردنی لە حوکمو شەراکەتی لە دامەزراوەکانی کوردستاندا.؟ بێگومان تورکمان دەبێت بە هێزی دووەم لە کوردستان، چی لە رووی ژمارە وەك پێگەی سیاسیش.
هەرچەندە هیچ ئامارو داتایەکی پشتراستم لە بەردەست نییە، بەڵام باوەرم وایە تورکمان رێژەیان لە کوردستان بگاتە نزیکەی (٢٠٪)ی دانیشتوانی هەرێمی کوردستانو بەوەش وەك پێکهاتی دووەم دەبنەخاوەن ئەو رێژەیە لە داهاتو سەرمایەو پشکی دەسەلات لە کوردستاندا.
ئەوکات یەکێك لە پۆستە باڵاکانی هەرێمی کوردستان (سەرۆکایەتی هەرێم، سەرۆکی حکومەت، سەرۆکی پەرلەمان) بۆ تورکمان دەبێت، چەندین وەزیرو بریکاری وەزیرو بەرێوەبەری گشتیو پۆستی ناو وەزارەتو فەرمانگەکان وەردەگرن. لە پەرلەمانی کوردستانیش دەبن بەخاوەن ژمارەیەك کورسی بەرچاو لە پەرلەمانو بەو هۆیەشەوە دەتوانن بە یاسا پارێزگاری لە مافو ئیمتیازو کلتوورو شارستانیەتو زمانی خۆیان بکەن.
ئەم رێگایە ژیانی تورکمان پێچەوانە دەکاتەوە، لەوەی لە عێراق هەمیشە بەرەو لەناوچوون دەچن، بەڵام لە کوردستان دەکەونەوە سەر رێچکەی بووژاندنەوەو زیندوو دەبنەوە.
پێویستە کورد ئەم تێگەیشتنە لای تورکمان دروستبکاتو بە پشتیوانی ئەوان کەرکوك بخاتەوە سەر هەرێم، چونکە دەبێت کوردو تورکمانیش لەوە دڵنیابن جگە لەو چارەسەرە، هەر رێگەیەکی تر بگرنەبەر چارەنووسی کوردو تورکمان پێکەوەو بە دوو قۆناغی جیاواز دەکەونەوە بەر پاکتاوی رەگەزی.

*** بەهەرێم بوونی بەشێك لە پارێزگاكانی كوردستان:-**

**بەیار عومەر عەبدوڵلا**

**یەدەكی نەوتی پارێزگای سلێمانی و ئیدارەی گەرمیان ٦٥٪ی كۆی یەدەكی نەوتی هەرێم پێكدەهێنێت و غازی سروشتیش لە ٨٠٪، بۆیە ئێستا سلێمانی بە دەوڵەمەندترین پارێزگای هەرێمی كوردستان دادەنرێت لەرووی یەدەكی نەوت و غازی سروشتییەوە (Åwena, 2015). ئەمە مانای ئەوەیە ئەگەر سنووری سەوزی جاران ببێت بە هەرێم و لە رووی ئابوورییەوە سەربەخۆیی بەدەست بێنێت، ئەو كاتە بەشی زۆری نەوت و غازی كوردستان كە لە پارێزگای سلێمانی و كەركوك و هەڵەبجە و ئیدارەی گەرمیان و راپەرینە بۆ خزمەتی خەڵكی ئەم سنوورە بەكاردێت لە جیاتی ئەوەی ببرێتە بانكەكانی توركیا هەمان شت راستە بۆ پارێزگای دهۆكیش، چونكە لەو حاڵەتەدا دەتوانێت سوود لە بەرهەمە مرۆیی و سروشتییەكانی خۆی وەربگرێت بۆ گەشەپێدانی ناوخۆیی. هەموو ئەم هەرێم و پارێزگایانەش دەتوانن بەشێك لە بودجەی خۆیان بدەن بە هەولێر كە پێویستە بۆ بەرێوەبردنی حكومەتی یەكگرتوو و فیدراڵ لەگەڵ سوپای نیشتمانی و سیاسەتی دەرەوە، كە پێویستە لە پایتەخت بن و لە حاڵەتی قەیرانی داراییدا، دەكرێت پارێزگاكان یارمەتی زیاتری پایتەخت بدەن.**

**داهاتی نەوت و غازی ئەم سنوورە هێندە زۆرە، گەر بێتو پارێزگای سلێمانی و هەڵەبجە و ئیدارەی گەرمیان و راپەرین ببن بە هەرێمێك، ئەوا نەك هەر كێشەی بێ مووچەیی و بێ بەنزینی نامێنێت، بەڵكو دەشێت سلێمانی ببێتە یەكێك لە سەنتەرە بازرگانی و ئابوورییە هەرە گرنگەكانی ناوچەكە هاوشێوەی دوبەی و هۆنگ كۆنگ. ئەوكات سلێمانی بێمنەتانە ئەتوانێت یارمەتی خوشك و براكانی خۆی بدات لە هەولێرو دهۆك و كەركوك و هەڵەبجە، لەجیاتی ئەوەی وەك ئێستا نەوت و داهاتی سلێمانی ببرێت و دانیشتووانەكەی بێبەش بكرێن لە مووچە و سووتەمەنی. سلێمانی نەك هەر خاوەنی سەرچاوەی سروشتییە، بەڵكو خاوەنی سەرچاوەیەكی مرۆیی زۆر گەورەشە. چەندین كەسی پسپۆڕو زیرەك و بەتوانا لە سلێمانیدا هەن، كە ئەتوانرێت سوودیان لێوەربگیرێت بۆ پەرەسەندنی خێرای ئابووری ئەم هەرێمە نوێیە.**

**گۆڕانی پارێزگای سلێمانی لە شارێكی كەم خزمەت و كەم مووچە و كەم سووتەمەنی و بەشخوراوەوە بەرەو شارێكی مۆدێرنی دەوڵەمەندی پڕ خزمەت كە ببێتە سەنتەرێكی بازرگانی و ئابووری گەورەی ناوچەكە، نەك هەر لە رووی ئابوورییەوە سەركەوتنێكی گەورەیە، بەڵكو لە رووی مەعنەویشەوە خەڵكی ئەم سنوورە ئاسوودە ئەكات. چونكە هەستانەوەی سلێمانی و بوونی بە سەنتەرێكی بازرگانی لە ناوچەكەدا بە دڵنیاییەوە ئەبێتە جێی شانازی و خۆشحاڵی خەڵكەكەی. لە كوێ كێشەی مووچە و نان و سووتەمەنیت هەبێت، لە كۆی ئەوندە دەوڵەمەندبیت، بتوانیت یارمەتی خوشك و براكانت بدەیت لە هەولێرو دهۆك و كەركوك و هەڵەبجە.**

**یەكێك تر لە سوودەكانی لامەركەزیەت و بەهەرێمبوونی پارێزگای سلێمانی ئەوەیە كە رێگری دەكات لە قەیران و دارمانی ئابووری وەك ئێستا لە كوردستاندا دەیبینین. مەبەستم ئەوەیە لە حاڵەتی بوونی سیستەمێكی فیدرالیدا، كە هەر شارە و خاوەنی سیاسەتی ئابووری و سەروەت و سامانی خۆی بێت، ئەگەر شارێكیش ئیفلاسی كرد، ئەوا شارەكانی تر ئەتوانن یارمەتی بدەن تا هەڵئەسێتەوە سەر پێی خۆی. واتە ئەگەر سلێمانی ئێستا هەرێمێك بوایە، لەوانەیە ئەم كارەساتە ئابوورییە رووی نەدایە. واتە ئەگەر لە داهاتوودا سیاسەتی ئابووری پارتی شكستی هێنا لە هەولێرو دهۆك و سیاسەتی ئابووری گۆڕان و یەكێتی و لایەنەكانی تر سەركەوتنی بەدەستهێنا لە سلێمانی و كەركوك و هەڵەبجە، ئەوا دەكرێت سلێمانی و كەركوك و هەڵەبجە یارمەتی هەولێرو دهۆك بدەن تا هەڵئەسنەوە، وە ئەگەر لە كاتێكی تردا سیاسەتی ئابووری پارتی سەركەوتووتر بوو لە هی یەكێتی و گۆڕان و لایەنەكانی تر، ئەوا دەكرێت هەولێرو دهۆك یارمەتی سلێمانی و كەركوك و هەڵەبجە بدەن تا دەكەونەوە سەر پێی خۆیان. واتە سیستەمی فیدراڵی لە رووی ستراتیژییەوە زۆر سەركەوتووە و رێگرە لە دروستبوونی قەیران، بە پێچەوانەی سیستمی مەركەزییەوە كە هەموو تۆپەكانی لە یەك سەبەتەدایە و پایتەخت لە رووی ئابوورییەوە كەوت، ئیتر هەموو شارەكان وەك دۆمینە بەدوایدا دەكەون، یان كە سیاسەتی ئابووری حیزبێك شكستی هێنا، سەرتاسەری وڵاتەكە گیرۆدە بێت وەك ئێستای كوردستان.**

**یەكێكی تر لە نموونە سەركەوتووەكان پارێزگای كەركوكە، كە تەنها ١٢ ساڵە لە دەست رژێمی بەعس رزگاری بووە و بەردەوام هەڕەشەی تیرۆریشی لەسەربووە، وا خەریكە لە رووی گەشەی ئابوورییەوە ئەگاتەوە بە سلێمانی كە نزیكەی ٢٤ ساڵە رزگاری بووە. لەبەر ئەوەی كەركوك جۆرێك لە سەربەخۆی سیاسی و ئیداری و ئابووری هەیە و وەك هەرێمێك سەربەخۆ كاری كردوە و ئیدارەی كەركوك هەوڵیانداوە زۆرترین پارە بۆ پارێزگاكەیان بپچڕن و زۆرترین خزمەتی پێبكەن، لە كاتێكدا پارێزگای سلێمانی لەناو سیستەمێكی مەركەزیدا بەردەوام بەدرێژایی ئەم چەند ساڵە سزای سیاسی و ئابووری دراوە.**

**بە هەرێمبوونی پارێزگای سلێمانی تەنها داهاتی نەوت ناگەرێنێتەوە بۆ سلێمانی، بەڵكو داهاتی هەموو فەرمانگەكانی ئەم سنوورەش ئەگەڕێنێتەوە بۆ خەڵكەكەی. بۆ نموونە لای كێ رەوایە داهاتی گەورەی بەرێوەبەرایەتی هاتووچۆی سلێمانی، كە بەشی زۆری بەهۆی سزای سەرپێچی هاتوچۆوە كۆدەكرێتەوە، بنێردرێت بۆ پایتەخت و لەوێوە بۆ هەولێرو دهۆك خەرج بكرێت. واتە خەڵكی پارێزگای سلێمانی و هەڵەبجە پارە بدەن و پارەكەیان لە ناوچەی نفوزی پارتیدا خەرج بكرێت. بە واتایەكی تر هەر بەوەوە نەوەستاون پارەی نەوتی ئەم سنوورە بەرن. بەڵكو داهاتی فەرمانگەكانیشی ئەبەن بۆ خۆیان. بۆیە سەیر نییە**

کە خۆپیشاندان و تووندوتیژی تەنها لەم سنوورە هەیە. بەلام لە حالەتی بەهەرێمبوونی سلێمانیدا، داهاتی بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆی سلێمانی و هەموو فەرمانگەکانی ئەم سنوورە دەگەڕێتەوە بۆ خەلکەکەی و خزمەتی دانیشتووانی ئەم ناوچەیەی پێدەکرێت. ئەم داهاتە دەتوانرێت چەندەها شەقام و پردی یەکتربڕو تونێلی پێ دروستبکرێت لە سلێمانی و هەلەبجەو قەزاو ناحییەکانی ئەم سنوورەدا و کێشەی قەرەبالغی هاتووچۆی پێ کەمبکرێتەوە.

بە دلنیاییەوە بە هەرێمبونی پارێزگای سلێمانی پێگەی هەرێم لە رووی ئابووری و سیاسییەوە زۆر بەهێز دەکات و هەنگاوێك نزیکتری دەکاتەوە لە دروستکردنی دەولەت. چونکە لەو حالەتەدا لە کێبڕکێ وەك پێشتر باسمکرد لەنێوان شارەکان دروست دەبێت، ئەمەش چانسی دروستکردنی ئابوورییەکی ڕاستەقینەو پتەو زیاد ئەکات، لە رووی سیاسیشەوە دروستبوونی هەرێمی سلێمانی وا ئەکات کە جۆرێك لە فرەیی سیاسی دروست بێت و دەسەلات بە شێوەیەکی ئاسۆیی دابەشبێت بەسەر شارەکاندا و حکومەتی شارەکان چاودێری و بالانسی (Check & Balance) دەسەلاتی سەرۆکایەتی هەرێم و حکومەت بکەن و نەهێلن دیکتاتۆرییەت دروست بێت.

ئەمەش وادەکات ئابوورییەکی پتەوو دیموکراسییەتێکی ڕاستەقینەمان هەبێت و دەولەتانی ئەمریکاو ئەورووپاش زیاتر متمانەمان پێبکەن و پشتگیرمان بن بۆ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی. بە پێچەوانەی ئێستاوە کە خاوەنی ئابووری و سیاسەتێکی لاوازین و خەریکە سەرلەنوێ ئەچینەوە بەرەو دیکتاتۆرییەت. ئەمەش متمانەی زلهێزەکانی وەك ئەمریکاو بەریتانیاو فەرەنسا بەرامبەر کورد لاواز ئەکات. ڕاستە ئەم ولاتانە ئێستا چەك ئەدەن بە کوردو پێشمەرگە وەك بەشێك لە ستراتیژی بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر، بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئەوان پشتگیریی تەواوی کورد ئەکەن بۆ سەربەخۆیی. ئەگەر بمانەوێت پشتگیریی ئەوان بەدەست بێنین بۆ ڕاگەیاندنی دەولەتی کوردی، ئەوا پێش هەموو شت، ئەبێت ولاتێکی دیموکراسی خاوەن ئابوورییەکی بەهێز بنیاد بنێین بۆ ئەوەی کە ببێتە جێی سەرنجی هاوولاتیانی ئەمریکی و ئەورووپی و ڕای گشتی لەو ولاتانە بجوولێنین بە جۆرێك کە فشار لە حکومەتەکانیان بکەن بۆ پشتگیریی لە دروستکردنی دەولەتی کوردی. پێموایە یەکێك لەو ڕێیانەی کە ئابووری و سیاسەت و دیموکراسییەت پێش ئەخات لە کوردستان و دروستبوونی دەولەتی کوردی نزیك ئەکاتەوە لامەرکەزی کردنی دەسەلات و ڕاگەیاندنی هەرێمی پارێزگاکانە، نەك دروشمی بریقەدارو چڕکردنەوەی دەسەلات لە یەك شارداو لەو شارەشدا بۆ یەك حزب و لە حزبەشدا بۆ یەك بنەمالەو لەو بنەمالەیەشدا بۆ یەك کەس، کە جگە لە بێ مووچەیی و بێ بەنزینی و برسێتی و مالوێرانی هیچی تری لی سەوز نەبووە، چ جای ڕاگەیاندنی دەولەتی کوردی.

لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە کە بەهەرێمبوونی ئەم سنوورە نەك هەر سوودی هەیە بۆ باشووری کوردستان، بەلکو دەبێتە خێر بۆ ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا و باکووری کوردستانیش. چۆن؟ خۆشەویستی و باوەڕبوون بە کوردستانی گەورە لەم سنوورە زۆر بەهێزە، لە حالەتی بوون بە هەرێمی ئەم سنوورەدا، سلێمانی و هەلەبجە کەرکوك دەتوانن سیاسی و ئابووری و دیپلۆماسی خوشك و براکانیان بدەن لە کوردستانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا و باکوور. بە واتایەکی تر، بەهێزبوونی ئەم سنوورە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی یەکدەنگی و برایەتی کورد لە هەر چوار پارچەکە، بە پێچەوانەی ئەو ڕۆلەی ئێستا دەسەلات لە پایتەختەوە دەیگێرێت کە بریتییە لە بەکارهێنانی هێزی سیاسی و ئابووری و دیپلۆماسی هەرێم بۆ دژایەتیکردن و لاوازکردنی ئەو حیزبانەی نوێنەرایەتی کوردانی باکوورو ڕۆژئاوا دەکەن.

* کەرکوكو حەویجەو مەترسییەکانی عێراقی دوای داعش

جۆست هیلتەرمان

ئەو چەکدارانەی داعش کاتێك گوندەکەی شێخ بورهان مزهەر عاسییان لە باکووری عێراق داگیرکرد، تەنیا بەوەوە نەوەستان کە بەشێوەیەکی ئاسان ماڵەکەی لەگەڵ زەویی یەکسان بکەن، بەڵکو کێڵی گۆڕەکانی ئەو گۆڕستانەشیان تێکشاند کە دایکو باوکی تێیدا نێژراون.

هەنوکە شێخ بورهان مەزهەر عاسی، ئەو ئەندامەی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك کە خاوەنی ڕێزێکی زۆرە لەناو کەرکوکو ئەنجوومەنەکەشدا، ئاوارەیە لەناو کەرکوکدا، دوای ئەوەی داعش کۆنترۆڵی بەشێکی گەورەی ئەو پارێزگایەی کرد لە حوزەیرانی ساڵی ٢٠١٤دا، ئەوەش کە لە هەمووی خراپتر ئەوەیە، ئەو پیاوەی کە موڵکو ماڵەکەی شێخی تێکوپێکدا، ئەندامێکی هۆزەکەی خۆی بوو (هۆزی عوبێد).

جا لەم جۆرە ڕەفتارە شۆکاوییانە لە سەرەتای شەڕی دژی داعشدا زۆر باوو بەربڵاو بوو، هەروەك تیشك دەخاتە سەر ڕاستییەکی نائومێدکەر لە عێراق، داعش لە بنەڕەتدا بووەتە گرفتێکی لۆکاڵیو ڕێکخراوی داعشە عێراقییەکە ژمارەیەکی کەم چەکداری بیانی لەخۆگرتووە، بەڵکو لەبری ئەوە بووەتە ڕەنگدانەوەیەکی ڕیشەیی لەناو کۆمەڵگەی عەرەبی سوننەدا دژی سیستمی حوکمرانیی ئێستای عێراق.

ئەو زیانانە تەنها لەوێدا ناوەستن کە دەرهاویشتەی ئەو ڕووداوانەن کە لە ڕووکەشدا ئازاریان بەشێخ عاسی گەیاند، بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی سەرلەنوێ پیاو پیاوێنەو پێکهێنانی ناسنامەی نوێ سەرهەڵبدات، لە ناوچەیەکی عێراقدا کە زۆرترین ناوچەی فرە پێکهاتەو فرە کەلتوورە، تەنانەت وایلێهاتووە کە زۆرێك لە عەرەبە سوننەکانی کە لەلایەك بەرەنگاری (داگیرکاریی ئەمریکا)و لەلایەکی دیکەشەوە دژی ئەو نەخشەکێشانەوەیەو گۆڕانکارییە دیمۆگرافییە بوون کە حیزبە کوردییەکان دەیانکێشا، ئەمڕۆکە خۆیان لە ئامێزی میوانداریی هەمان ئەو حیزبانەدان وەك ئاوارەی ناوخۆییو تازە خۆیان کۆکردووەتەوە.

ئێستا وایلێهاتووە کە ئەوانە زیاتر لەگەڵ خواستەکانی کورددا هەڵدەکەنو وای لێهاتووە خواستەکانیان بۆ وەرگرتنی هاوکاریی لە ئەمریکا بۆ ئازادکردنی ناوچەکەیانو ماڵەکانیان لەژێر کۆنترۆڵی داعش بەتەواوەتی بەرجەستە بووە.

وێڕای ئەوەش بەشێکی زۆر لە کوردەکان هێشتاش گومانیان هەیە سەبارەت بە عەرەبە سوننەکانی نەیاری جارانیانو تەنانەت لەگەڵ داعشدا تێکەڵاویان کردوونو دەیانەوێت نەهامەتییەکانی ئێستایان بقۆزنەوە بۆ ئەوەی گوشاریان بخەنەسەر لە پێناوی بەدەستهێنانی دەستکەوتێك لەو کێشمەکێشە ئیتنیکییەی کە ماوەیەکی درێژە بەردەوامە کە بەمەش دەکەونە بەردەم مەترسیی ڕێگە خۆشکردن بۆ گەڕێکی داهاتووی کێشەو ململانێ.

* کورد گوشار دەکەن بۆ بەدەستهێنانی کۆنترۆڵ

ئەم دینامیکییەتە بەشێوەیەکی ئاشکرا لە کەرکوکدا دەردەکەوێت، داواکاری لەسەر ئەم شارە لەلایەن حکومەتە ناوەندییەکانو حیزبە سیاسییە کوردییەکانی عێراقەوە بەردەوام بووە، چ شارەکەو چ هەموو پارێزگاکەشو بەدرێژایی چەندین دەیە کێشمەکێش لەسەری بەردەوام بووە.

ئەو دەستوورەی عێراق کە لەدوای داگیرکاریی ئەمریکا دایڕێژرا، کۆمەڵێك میکانیزم و ڕێکاری دانـاوە بۆ چارەسەرکردنی دۆخی کەرکوك لە داهاتوودا، چ وەکو ناوچەیەکی سەربەخۆ، یان دارشتنی هەندێك ڕێوشوێنی سیاسیی دیکە، کە تائێستا هیچی نەچووەتە بواری جێبەجێ کردنەوە، لە ئەنجامی ئەو بێ ئومێدبوونەش کە ئەم کەموکورییەی هێنایە بەرهەم لەوەی هەنگاوێك بۆ پێشەوە بنرێتو پێشقەچوونێك بەخۆوە ببینێت، حیزبە کوردییەکان گوشاریان کردو بەرەو پێشەوە چوونو توانیان بەرەبەرە کۆنترۆڵی ئیدارەو ئاسایشی شارەکە بگرن بەدەستەوە، ئەمە لەکاتێکدا داعش لە حوزەیرانی ساڵی ٢٠١٤دا دەستیگرت بەسەر ئەو ناوچانەی کە زۆرینەی دانیشتووانەکەی عەرەبی سوننەن لە باشوورو خۆرئاوای کەرکوك، هەرچی کوردیشە هێزەکانی خۆیان لە شارەکەو لەو ناوچانە پتەوکرد کە زۆرینەی دانیشتووانەکەی کوردن، وەك خۆرهەڵاتو باکووری شارەکەو نزیکەی ٦٠٪ی ڕووبەری شاری کەرکوکی بۆ سەر ناوچەکانی خۆی زیادکردووە.

ئێستا کە زیاتر لە ٧٠٠ هەزار ئاوارە کەوتووەتە دەرەوەی دەسەڵاتی داعشەوەو هەندێکیان هەر لە بنەڕەتدا خەڵکی پارێزگاکەن، بەڵام هەندێکیان لە پارێزگا نزیکەکانی دەوروبەرەوە دێنە کەرکوك، وەك دیالەو سەڵاحەدینو ئەنبار. زۆربەی هەرە زۆری ئەو ئاوارانەش لە پێکهاتەی عەرەبی سوننەن کە بەهۆی هاتنی داعشەوە لە گوندو ماڵو حاڵیان ڕایانکردووە، یاخود بەهۆی ئەو هەوڵە تووندوتیژانەی دواتر هێزەکانی حکومەتی بەغداو میلیشیا هاوکارەکانیان خستیانەگەڕ بۆ دەستبەسەرداگرتنیان، هەروەها لە هەندێك حاڵەتیشدا نەبوونی ئارامیو سەقامگیریی دەبێتە مایەی ڕێگریی لەو کەسانە لە گەڕانەوە بۆ ماڵو حاڵو ناوچەکانیان. بەدیوێکی دیکەشدا هەندێك جار لایەنە سیاسییە دەسەڵاتدارەکانی وەك (میلیشیا شیعەکانو پێشمەرگە) پێیان باشە هەرگیز ئەوانە وا بە ئاسانی نەگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان.

* بەهەرحاڵ وێرانکاریی پەل دەهاوێت بۆ حەویجە

ئێستا حەویجە، ئەو شارەی کە زۆرینەی دانیشتووانەکەی عەرەبی سوننەنو لەناو دڵی زەوییە کشتوکاڵییەکانی ئەو پارێزگایەدان، بووەتە خاڵی میحوەریی لە ململانێ یەکتربڕەکاندا لەلایەك لەنێوان عەرەبی شیعەو عەرەبی سوننە، لەلایەکیش لەنێوان کوردو عەرەب لە ساڵی ٢٠١٣.

لەو کاتەدا دانیشتووانی ئەو شارە ڕاپەڕین لە بەرامبەر دەستگیرکردنی کوێرانەو فەراموشکردنی دامودەزگاکان لەلایەن حکومەتەکەی نووری مالکییەوە، بەڵام ئەو

نارەزایەتییانـە بـە سـەرکوتکردن وەڵامدرایـەوەو لە ماوەی چەنـد ڕۆژێکـدا نزیکـەی ٤٠ کەسـی مەدەنـی کـوژران، لە ڕووبەڕووبوونـەوەی توونديـان لەگـەڵ هێـزە ئەمنییەکاندا، ئەمەش شارەکەی کردە کۆمەڵگەیەك بۆ کۆکردنەوەی هەموو ئـەو هۆکارانەی بوونە مایەی ئاسـانکاریی بـۆ ئەوەی دوای یەك ساڵ لەو وادەیە داعش دەستی بەسەردا بگرێت.

ئەمڕۆ داعش وایلێهاتووە زۆرترین دەستکەوتەکانی لە زەوی لەدەستداوە، لەولاشەوە هەڵمەتی ئازادکردنی موسڵو شارۆچکەو گوندەکانی چواردەوری لە سنووری پارێزگای نەینەوا لە ئامادەکاریدایە.

بـەڵام هێشـتا حـەویجە لـەژێـر چنگـی ئـەو گـرووپـە توندڕەوەدایە، تەنانەت ئەو ناوچەیەی لەژێر کۆنترۆڵی ئەو گرووپەدایە لە کەرکوك لە ناوچەکانی دیکەی ژێر دەستی گرووپەکە دابڕێنراوە چ لە باکوورییەوە تا دەگاتە سوریا، لە ئەنجامی ئەوەشدا دانیشتووانەکەی بەدەست برسێتیو نەبوونی هەلومەرجی ژیانەوە دەناڵێنن، بەهۆی دابڕانیان لە دەورووبەرەکەیانو تەنانەت ئەو ناوچانەی دیکەش کە لەژێر دەسەڵاتی داعشدانو بازرگانیش لەگەڵیاندا وەستاوە.

بەو هۆیەشەوە ناشێت ئازادبوونی ئەو خەڵکە وا بەزووی بێتە دی، سەبارەت بە دانیشتووانی قەزای حەویجە. بەڵام پرسیارە گەورەکە ئەوەیە کە ئاخۆ ئەوە بەدەست کێیە؟ هەرچی سوپای عێراقە ئـارەزووی ئـەوەی نییە جارێکی دیکە سەرپەنجەی خۆی داخ بکاتەوە لەو شارە، بگرە ئەو هەموو هەوڵی خۆی خستووەتە گـەڕو ئامادەکارییەکی مەترسیدار دەکات بۆ کۆنترۆڵکردنەوەی موسڵ، بەمجۆرەش دانیشتووانی ناو شارەکەو سیاسییە دەربەدەربووەکان لەبەردەم بژاردەیەکی نـەخـوازراوی میلیشیاکاندا بەجێهێڵراون، چ هێزەکانی حەشدی شەعبی کە لەلایەن ئێرانەوە پشتیوانیی دەکرێنو کە واناسراوە پاکسازیی ئەو ناوچە سوننە نشینانە دەکات کە ئازاد دەکرێن، یان هێزی پێشمەرگەی کورد کە ئەوانیش لە هەندێك لەو کردەوانە تێوەگلاون لە دژی دانیشتووانی عەرەب.

خۆ ئـەگـەر کـارەکـە بـۆ خـودی دانیـشـتـووانـی حـەویجە بەجێ بهێڵدرێت، ئەوا هیچ کام لەو دوو ئەڵتەرناتیڤەیان هەڵنەدەبژارد، بەڵکو وایان پێباشتر بوو کە هێزێکیان هەبێت تایبەت بێت بەخۆیان لەو ناوچانەدا. بەڵام میلیشیا بەهێزەکان ڕێگەی نەداوە هێزی تایبەت بەخۆیان دروستبکات، بەجۆرێك ئێستا خزاونەتە ناو هەندێك حیساباتی بێ هیواییەوە.

کـەوابێ ئـەوە کـوردن کە دێـن، دوورنییە کە هـەوڵـی تۆڵە سەندنەوە بدەن لەو تاوانی لەسێدارەدانە وەحشییانەیەی داعش کە بەرامبەر پێشمەرگە دیلەکان کردیانو لەوانەیە گـەنـدەڵـی بـڵاوبـکـەنـەوەو وێـرانـکـاریـی دروسـت بـکـەن، بۆ ئـەوەی بیکەنە ڕێگرێك لـەوەی دانیشتووانە عەرەبەکانی ئەوێ هەر هەوڵێك بدەن بۆ ئاستەنگ دروستکردن لەبەردەم خواستەکانی کورد لە پارێزگای کەرکوك.

هەروەك عەرەبە سوننەکان سڵ لەوە دەکەنەوە کە کورد هەوڵی جیاکردنەوەی ناوچە عەرەبییەکان بدەن لە کەرکوكو بیلکێنن بە پارێزگای سەلاحەدینی هاوسێیەوە کە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندییەوەو لەو ڕووەشەوە عەرەبە سوننەکانی کەرکوك دژی هەنگاوێکی لەو جۆرەن، چونکە ڕەنگە ئەمە ببێتە مایەی بێبەشکردنیان لە گەیشتنیان بە بازارە دێرینەکەیان کە تایبەتە بەساغکردنەوەی بەروبوومە کشتوکاڵییەکەیانو هەروەها بۆ سامانی نەوتی کەرکوك.

هەندێك لە دانیشتووانی حەویجە هیواخوازن بەخت یاوەریان بێتو لەلایەن میلیشیا شیعەکانو حەشدی شەعبییەوە ئازادبکرێن، چونکە ئەو میلیشیایانە ئەوەندە بەلایانەوە گرنگ نەبووە کە سوننە بگۆڕن بەشێوەیەکی هەمیشەیی لە ناوچەیەکدا کە شیعەی تێدا نەبێت، سەرباری ئەوەش وای بۆدەچن شارۆچکەکە ناکەوێتە سەر درێژایی ئەو ڕێگایەی کە وەکیلەکانی ئێران هەوڵی پاککردنەوەو زامنکردنی دەدەن لەنێوان سنووری ئێرانو سوریادا، هەر بۆیە هەر پرۆسەیەکی سەربازییش کە میلیشیاکانی حەشدی شەعبی جێبەجێی بکەن، لەلایەن فرۆکەی ئەمریکاوە پشتیوانی ناکرێت، کە بەوە جەنگەکە درێژە دەکێشێت لەگەڵ داعشداو دەبێتە مایەی زیاسنی گەورە بەشارەکە. هەروەها دانیشتوانی شارەکە لەوەش سڵدەکەنەوە ئەو وێرانکارییە لە هەموو حاڵەتێکدا هەر ڕوودەدات.

*** مامەڵەی سەرکەوتووەکان لەگەڵ دۆڕاوەکان زۆرشت دیاریی دەکات**

وەك ئاشکرایە خەڵکی حەویجەو هەموو ئەو ناوچانەی کە داعش کۆنترۆڵی کردوون شتێکی ئەوتۆیان نییە، شێخ عاسی پێی وتم: ئێمە بەشێك نین لە ڕژێمی پێشوو، هەروەك ناشبینە بەشێك لەم تۆرە تیرۆریستییەی ئێستا، بەڵام بەر لە ١٠ ی حوزەیرانی ساڵی ٢٠١٤ (واتە ئەو ڕۆژەی موسڵ کەوتە دەستی تیرۆریستانەوە) تۆمەتبارکراین، جارێك بەوەی لایەنگری سەدامینو جارێك بەوەی لایەنگری داعشین.

لەڕاستیشدا زۆرینەی هاووڵاتیان وانەبوونو هەرگیز بەشێك نەبوون لە هیچکام لەو دووانە، بەڵام هێشتاش ئەو تۆمەتبارکردنە هەر ماوەو هەیە، ئەمەش پشتی بە لۆژیکێك بەستووە کە زۆربەی سەرکردەو کادرەکانی داعش لە ئەفسەرانی ئەمنی سەربە ڕژێمی پێشوون.

بۆیە چۆنییەتی مامەڵەی براوە لەگەڵ دۆڕاوەکاندا سروشتی شەڕەکانی داهاتوو دیاریی دەکەن، لەبەرئەوەش کە هیچ ستراتیژێکی سەربازیی گشتگیر لەعێراقدا نییە بۆ دیاریکردنی چۆنێتی ئەوەی کە پێویستە بۆ گەڕاندنەوەی ئەو ناوچانەی کە داعش کۆنترۆڵی کردوون، یاخود لەسەر دەستی کێدا، بۆیە هەر لایەنێك لەناو جەنگی دژبە داعشدا، هەوڵی ئەوە دەدات ئامانجە تایبەتییەکانی خۆی بەدیی بهێنێت. ئەگەر ئەو ئامانجانە لە زۆر حاڵەتدا ببێتە مایەی سزای بەکۆمەڵی پێکهاتەی عەرەبی سوننەش، تەنانەت هەندێك جار ئەو سزایە بە ڕەفتاری وەحشیگەرانەش دەبێت. کە ئەمەش چەندین ئەگەری خەفەکراو لەخۆدەگرێت، کە هەندێکیان مایەی مەترسین.

ئەمەش واتای تێوانینە لە هەموو کۆمەڵگە بەوەی کە دابەشبووە بەسەر ئایدیۆلۆژیای دەمارگیرو بکوژی

ژمارەیەکی کەم لە ئەندامەکانی ببێتە گرەنتیی ئەوەی کە کەمینەیەکی توندڕەوەکان زۆر بن.
ئەمەش وادەردەکەوێت کە بەهۆی ئەو جۆرە کردەوانەوە ئایندەی گروپگەلی هاوشێوەی داعش و قاعیدە گەش بێت، سەرباری ئەو زیانە ئیقلیمییانەی بەر ئەو دوو ڕێکخراوە دەکەوێت بەم نزیکانە، یاخود هەر بەو هۆیەوە، کە پابەندیی خۆیان بەوەوە سەلماندووە، بەو حوکمەی کاتێك دەستدەگرن بەسەر خاکی هەر ناوچەیەکدا دەبێتە بارگرانییەك بەسەریانەوەو ئەو دوو ڕێکخراوە ئامادەیی ئەوەیان تێدا نییە کە بتوانن بیبووژێننەوە.
ئەگەر ویستی ئەوە هەبێت کە شکست بەداعش بهێنن و پێشکەوتنێکی ڕاستەقینە بەدەست بهێنن، لەجیاتی کردنەوەی دەروازەی قۆناغێکی نوێی کێشمەکێش، ئەوا عێراق پێویستی بەوەیە کە عێراق هێزێکی لۆکاڵی دروست بکات بۆ پارێزگاریی لەو ناوچە عەرەبنشینانەی کە بەمدواییانە ئازادکراون.
بەڵام پاساوی ئەوەی کە دەوترێت ڕەنگە ئەو ئەندامانی ئەو هێزە هەڵگەڕێنەوەو پەیوەستبن بەداعشەوە، هەر ئەوانە خۆیان ناگرن، چونکە پاش هەموو شتێك مەترسییەکی ڕاستەقینە هەیە لەوەی کە هەموو دانیشتووانەکە پەیوەست بن بەو گروپە توندڕەوانەوە بەهۆی کەڵەکەبوونی مەینەتییەکان لەژێر فەرمانڕەوایی حەشدی شەعبی شیعە یان لەژێر فەرمانڕەوایی هێزەکانی پێشمەرگەی کورددا.
لە ساڵی ٢٠١٤ هەر ئەوەبوو کە ڕوویدا، کاتێك سوپای عێراق (کە لەژێر هەژموونی شیعەدا بوو) هەوڵی بۆ دا، ئەو هێزەی کە دانیشتووانی ئەو ناوچانە بە هێزێکی دوژمنکار لێیان دەڕوانی و وەك سەرەنێزەی هێزی بیانی لێیان دەڕوانی، کە هەژموونی خۆیان سەپاندبوو بەسەر موسڵدا لەجیاتی پاراستنیان.
بەرەچاوکردنی ئەو فرە ڕەنگییەی کە کەرکوکی لە شارەکانی دیکە پێ جیادەکرێتەوە، بێگومان پاراستنی ئاشتی لەو شارە هەمیشە قورسترە لە بردنەوەی جەنگ. زۆربەی گرووپە لۆکاڵییەکان هەوڵی پێشوەختە دەدەن لەپێناوی پاراستنی پێکهاتەی هاوبەشی کۆمەڵایەتی لە هەرەسهێنان لەسەر دەستی لایەنە دەرەکییەکان کە خاوەنی عەقڵییەتێکی شۆڤێنیستی و ئامانجی چاوچنۆکانەن.
کاتێك نەجمەدین کەریم دەرکەوت، کە بۆخۆی پزیشکی مێشك و دەماری خانەنشینە لەویلایەتی ماریلاند، کە ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك وەك حوکمڕانی کەرکوك هەڵیبژارد لەساڵی ٢٠١١دا وەك پاڵەوانێکی چاوەڕواننەکراو بۆ پارێزگاری لە کۆمەڵگەی کەرکوکی فرە کەلتوور. کەریم خۆی ئەندامێکی دێرینی بزووتنەوەی کوردە، کە ئەو بزووتنەوەیەی خۆی بەشێوەیەکی تەقلیدی هەوڵی ئەوەی داوە کەرکوك بۆ کورد مسۆگەر بکات و پێشی باشبووە لەگەڵ کەمینەیەکی کەمی عەرەبدا بمێنێتەوە، بەڵام شارەزایی لە شێوازی حوکمڕانیی ئەم ناوچە ئاڵۆزەدا لە ماوەی پێنج ساڵی ڕابردوودا وەك بەم دواییانە خۆی بۆی گێڕامەوە، ئەوەی فێرکردووە کە کورد بەتەنها ناتوانن بەئاسانی ویست و ئیرادەی خۆیان بسەپێنن بەسەر ئەوانی دیکەدا بۆ دیاریکردنی چارەنووسی کەرکوك ئەگەر بەرەسمیش بۆ کورد یەکلایی ببێتەوە، کە وابکەن پارێزگاکە ناچاری ئەوە بکەن بچێتە چوارچێوەی هەرێمی کوردستانەوە لەڕێگەی ڕاپرسییەوە کە مشتومڕی زۆری لەسەرە، کە ئەوە ڕەنگە بۆ داهاتوو کۆمەڵگەیەکی جەمسەرگیر بەشێوەیەکی قووڵ بەجێ بهێڵێت، بۆیە پێی وابوو «پێویستە ئەو ناوچەیە سەربەخۆیی هەبێت لەناو عێراقدا بۆ ماوەیەکی ڕاگوزەر لەنێوان ٥-١٠ ساڵ» ئەمە وەك ئەوەی ئەو پێی وتم.
لە کۆتایی ئەو ماوەیەشدا، نەجمەدین کەریم هیوادارە، خەڵکی کەرکوك جۆرێك لەمتمانە بەیەکتریی بەدیبهێنن و ئەو کاتە ڕێگەیان پێ بدرێت کە ئەو شوێنە هەڵبژێرن کە خۆیان دەیانەوێت ببێتە نیشتمانیان، جا لەژێر حوکمڕانیی بەغدایە، یان لەژێر حوکمڕانیی هەولێری پایتەختی حکومەتە کوردییەکەیە، یاخود دەخوازن وەك شوێنێکی خۆبەڕێوەبەریی و حاڵەتێکی تایبەتی و دەسەڵاتێکی تایبەتی بەڕێوەی بەرێت.
وێڕای ئەوەش نەجمەدین کەریم وتی: «پێویستە حەویجە ببێتە پارێزگایەك لەناو چوارچێوەی ناوچەی کەرکوکدا، بەحکومەتی لۆکاڵی و بودجەی تایبەتی خۆیەوەو بەدەربڕینێکی دیکەش پارێزگاریی لە پەیوەندییە ئیدرایی و ئابوورییە گرنگەکانی بکات لەگەڵ کەرکوکدا کە لەژێر هەژموونی کورددایە.
پارێزگار کاتێك ئەم بژارەیە پێشنیاز دەکات، لەکاتێکدایە کە دەزانێت کەرکوك وەك ناوچەیەکی سەربەخۆ دەشێت سوودی زۆر لە سەروەت و سامانەکەی و داهاتەکانی نەوتەکەی بکات وەك ئەوەی ئێستا هەیە، چونکە هەریەکە لە بەغداو هەولێر ئەو شارەیان بێبەشکردووە لەداهاتی نەوتەکەی لە ڕێگەی گرێبەستێکی قازانجدارەوە کە تەنها خەڵکی کەرکوك لێی بێبەشن کە ئەمە بۆخۆی شتێکی نامۆیە.
نێچیرڤان بارزانی سەرۆك وەزیرانی هەرێمی کوردستان پشتیوانیی پارێزگاری کەرکوك دەکات لە هەوڵەکانیدا، بەڵام ئەویش و کەریمیش سوورن لەسەر ئەوەی کە پێویستە دۆخی کەرکوك ڕەچاو بکرێت، لانیکەم بەشێوەیەکی ڕەمزی وەك خاکی کوردستان، وەك ئەو شێوازەی کە سەیری ناوچە کوردییەکانی دیکەی دەرەوەی عێراق دەکرێت کە ناوچەی کوردستانین. سەرباری ئەوەش ئەو فەرمانڕەوایە سوورە لەسەر ئەوەی کە هەر شێوازێکی تایبەت دابنرێت بۆ ئایندەی کەرکوك، دەبێت ملکەچی ڕەزامەندیی پەرلەمانی کوردستان بێت، کە ڕەنگە ئەوە ببێتە ئاستەنگێکی گەورە.
ئەم هەڵوێستەی نەجمەدین کەریم تەنانەت خستییە ناکۆکییەوە لەگەڵ حیزبەکەی خۆشیدا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، کە بەپێی هەندێك سەرچاوە ئەندامە توورەکانی حیزبەکەی هەڕەشەی دەرکردنیان لێکرد لە حیزبەکەش.
بەڵام یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ئێستا لاوازە، بەهۆی نەخۆشیی سەرکردەکەیەوەو بەتایبەتیش دوای سەرهەڵدانی ململانێ ناوخۆییەکانی لەسەر دەسەڵات.
لەلایەکی دیکەشەوە هەستدەکرێت پارێزگاری کەرکوك

لەسەر هەقە، کە ئەو پشتگیریی دانیشتووانی شارەکەی هەیە لەناویاندا کوردیش، کە بە نیگەرانییەوە لە حوکمرانیی حیزبە کوردییەکان دەڕوانن بەوەی بێتواناو گەندەڵن، بۆیە لەبەر هەموو ئەوانە، کەوابێ ساتەوەختی یەکلاکردنەوە ئێستایە، هێندەی ئەوەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەناوچەیەکی ئومێدبڕاو دەبینرێت، بۆیە هێشتا بەشێك لەو سەرکردانەی کە تێروانینێکی واقیعییان هەیەو سەرکردەی پراگماتیکین‌و دەرفەتێکیان هەیە بۆ کێشانی نەخشە ڕێگەیەکی ئاشتییانەو هەمەلایەن بەرەو پێشەوە.

هەقوایە کۆمەڵی نێودەوڵەتی پشتگیریی ئەمجۆرە سەرکردانە بکات، بەو پێیەی کلیلی گرەنتیی ئەوەیان پێیە کە شکستهێنانی داعش نەبێتە سەرەتای دەرکەوتنی ئاماژەی چەند جەنگێکی ئیتنیکی‌و ئایینی نوێ.

* سەرچاوە:-
-گۆڤاری فۆرین پولیسی.





# ئامارەکانی
# بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی کەرکوك
# دەربارەی ڕووداوەکان



ئامادەکردنی: کاوە محەمەد (خەیام)

## * دەربڕینێکی پێویست

كاوە محەمەد (خەیام).
لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە باری ئەمنی لە کەرکوك‌و سەرتاپای عێراقدا گۆرانکاری گەورەی بەسەرداهات چ لەرووی فراوانی ڕووداوەکان‌و زۆری ئامارو کێشە جۆر بەجۆرەکان.
لە ماوەی بەڕێوەبردنی کاروباری عێراق لەلایەن ئەمریکییەکان‌و هێزی هاوپەیمان لە سەرتاپای عێراقدا هەستان بە دامەزراندنی (سەنتەری هەمانگی پەیوەندییە هاوبەشەکان (PJcc) بە هەماهەنگی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی پارێزگاکان کەرکوکیش یەکەم سەنتەر بوو کە لە بەڕێوبەرایەتی پۆلیسی کەرکوك دامەزراوە پێش پارێزگاکانی تری عێراق‌و هەڵسا بە ئامارکردنی ئەو ڕووداوانەی کە لە شاری کەرکوك‌و دەورووبەریدا ڕوویانددەدا بە تایبەت ئاماری کردەوە تیرۆریستییەکان.
بەشەکانی ئەم سەنتەرە بریتی بووە لە نوێنەری سەرجەم دامودەزگاکانی شاری کەرکوك‌و هەر وەکو نوێنەری هێزکانی هاوپەیمانانی تا ساڵی (٢٠١١) و لە کاتی کشانەوەیان لە عێراق لەو سەنتەردا ڕۆڵیان هەبوو، کە کاری ئەم سەنتەرەش گۆرینەوەو زانیاری بوو لەنێوان سەرجەم دام دەزگاکانی کەرکوك‌و دواتر لەگەڵ پارێزگاکانی دیکەی عێراقدا.
هەرچەند ئەرکێکی گەورە لەسەر ئەم سەنتەردایە بەڵام بەدەرنیە لەکەم‌و کوری، ئاماری چەوت یاخود ناراست یا نادروست ئەویش بەهۆی ئەوەی بەشێکی ئەم ئامارانە لە شوێنی ڕووداوەکەوە وەردەگیرێت یان لە دامودەزگای ئەمنی‌و کارگێرییەکانی پارێزگاکان سەرچاوە دەگرێت کە هەندێك جار زیادو کەم لە ئامارەکان دروست دەبێت کە پێویستی بەپێداچوونەوەو دووبارە دارشتنەوە هەیە، بۆ ئەوەی بچێتە سەربارێکی ڕاست‌و دروست، بەڵام بەداخەوە بەهۆی زۆری ڕووداوەکان‌و ناگونجاندنی باری ئەمنی شارەکەو نەبوونی پسپۆری دیاریکراو بۆ ئەم کردووە بەشێك لەو ئامارانە بەکاڵ‌و کرچی دەرچن یان نەتوانرێت دووبارە دارشتنەوەی بۆ بکرێت.
ئێمە وەکو دەستەی نووسینەوەی ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك هەوڵمان داوە، بەپێی توانا ئامارەکان لەسەر بارێکی ڕاست‌و دروست پۆلێن بکەین‌و بیخەینە بەردەستی خوێنەری بەڕێز هیوادارین لەدواڕۆژدا بەشێوەکی بەرفراوان بیخەینە بەردەستان.
لە کۆتاییدا پێویستە سوپاسی بەڕێز عەمید یادگار شوکور بکەم کە بەراستی ڕۆڵی گرنگی بینی لە سەرخستنی ئەم پرۆژەیە، هەروەك سوپاسی برای بەڕێز نزار حەبیب‌و ئەو هاوڕێیانەی کە هاوکارم بوون بۆ ئامادەکردنی ئەم پرۆژەیە.



| ژ | جۆری ڕووداوەکانی کەرکوک لە ساڵی ( ٢٠٠٥ ) | کانوونی دووەم | شوبات | مارت | نیسان | مایس | حوزەیران | تەمووز | ئاب | ئەیلوول | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانوونی یەکەم | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ڕفاندن | ١٠ | ٦ | ٣ | ١١ | ٩ | ٩ | ٣ | ٣ | ٥ | ٩ | - | - | ٦٨ |
| ٢ | گومان لێکردن | ٤ | ٥ | ٧ | ١١ | ١٥ | ١٧ | ١٢ | ١٢ | - | ٥ | - | - | ٨٨ |
| ٣ | دەستڕێژی گولله | ٤٠ | ١٧ | ١٧ | ١٠ | ١٨ | ١٥ | ٢٦ | ٢٦ | ٢٠ | ٢٨ | - | - | ٢١٧ |
| ٤ | تیرۆر | ١ | - | ٢ | ١ | ٢ | ٤ | ٤ | ٤ | ٢ | - | - | - | ٢٠ |
| ٥ | دەستگیرکردن/ دەستگیرکراو | ١ | ١ | ١٣ | ٥ | ٥ | - | ٥ | ٥ | ٥ | ٤ | - | - | ٤٤ |
| ٦ | تەقینەوە | ٢ | ١ | ٢ | - | ٣ | ٢ | ٤ | ٤ | - | - | - | - | ١٨ |
| ٧ | تەقینەوەی ئۆتۆمبێلی بۆمبڕێژکراو/ماتۆڕ | ٨ | ٢ | ٤ | - | ٥ | ١٠ | ٦ | ٢ | ٤ | ٣ | - | - | ٤٤ |
| ٨ | تەقینەوەی بۆمب/نارنجۆك/قازیفە | ٧٣ | ٢١ | ١٩ | ١٨ | ٢٥ | ٤٦ | ٥٣ | ٥٣ | ٤٩ | ٦٢ | - | - | ٤١٩ |
| ٩ | دزی و تاڵان | ٣ | ١ | - | - | ٢ | - | ٢ | ٢ | - | ١ | - | - | ١١ |
| ١٠ | ڕووداوی هاتووچۆ/شێلان | ١٠ | ٨ | ١١ | ٧ | ١٤ | ٤ | ٨ | ٨ | ٩ | ١٠ | - | - | ٨٩ |
| ١١ | سووتان | ١٠ | ٧ | ٥ | ٢ | ٦ | ١ | ٥ | ٥ | ٥ | ٢ | - | - | ٤٨ |
| ١٢ | ڕووداوی غاز و نەوت/بۆری نەوت | ١٦ | ٦ | ١ | ١ | ١ | ٢ | - | - | - | ٤ | - | - | ٣١ |
| ١٣ | دۆزینەوەو دەستبەسەراگرتنی ئۆتۆمبێل | ١٣ | - | ١ | ٢ | - | ٩ | ٦ | ٦ | ٧ | - | - | - | ٤٤ |
| ١٤ | کەوتنەوەی مووشەك و هاوەن و ڕووناککەرەوە | ٧ | ١٣ | ١٣ | ٩ | ٩ | ١٠ | ٣ | ٣ | - | - | - | - | ٦٧ |
| ١٥ | دۆزینەوەی لاشە/منداڵی فڕێدراو | ٩ | ٨ | ٧ | ٥ | ٦ | ٣ | ٨ | ٨ | ٨ | ٣ | - | - | ٦٥ |
| ١٦ | دۆزینەوەی مووشەك/قازیفە | ٨ | ٤ | ٥ | ٨ | ٣ | ٣ | ٤ | ٤ | ٨ | ٦ | - | - | ٥٣ |
| ١٧ | دۆزینەوەی بۆمب/نارنجۆك | ٣٠ | ١٣ | ٢ | ٢٣ | ٢٧ | ١٩ | ٣٤ | ٣٥ | ٢٨ | ٥٨ | - | - | ٢٦٩ |
| ١٨ | دۆزینەوەی ئامرازەکانی تەقینەوە | ١٠ | ٢ | ١ | ٤ | ١ | ٧ | ٤ | ٤ | ٦ | ٣ | - | - | ٤٢ |
| ١٩ | کوشتن | ١٣ | ٤ | ٤ | ٣ | ٩ | ٧ | ٦ | ٦ | ٦ | ٢ | - | - | ٦٠ |
| ٢٠ | بەسەردادان | ١ | - | - | - | - | - | ٣ | ٣ | ٣ | ٥ | - | - | ١٥ |

| | | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢١ | شەڕو پێکدادان | ٢ | ١ | - | ٢ | - | ١ | ٤ | ٤ | ٤ | ٥ | - | - | ١٨ |
| ٢٢ | خۆپیشاندان | ٤ | ٤ | ٥ | ١ | ١ | - | ٢ | ٢ | ٢ | ٣ | - | - | ٢٤ |
| ٢٣ | مردن/ بزربوون | ٢ | - | ١ | ١ | ١ | - | - | - | - | - | - | - | ٥ |
| ٢٤ | فڕێدانی ئارنجۆك/قازیفە/ بۆمب | - | ١ | ١ | - | - | - | ٢ | ٢ | ٥ | ١٨ | - | - | ٢٩ |
| ٢٥ | هەڕەشە | - | - | ١ | - | ٢ | - | - | - | - | ١ | - | - | ٤ |
| ٢٦ | دزینی ئۆتۆمبیل | - | - | - | - | ١٢ | - | - | - | - | ٣ | - | - | ١٥ |
| ٢٧ | دۆزینەوەی ئۆتۆمبیلی بۆمب ڕێژکراو | - | - | ٤ | - | - | ٢ | ٢ | - | ٢ | - | - | - | ١٠ |
| ٢٨ | دۆزینەوەی بڵاوکراوە | - | - | ١ | - | - | - | - | - | - | - | - | - | ١ |
| ٢٩ | نوقم بوون لە ئاودا | - | - | ١ | - | - | ١ | - | - | - | - | - | - | ٢ |
| ٣٠ | خۆکوشتن / هەوڵدان بۆ خۆکوشتن | - | ١ | ١ | - | ٢ | ١ | ١ | ١ | ١ | ٣ | - | - | ١١ |
| ٣١ | تەقاندنەوەی خۆکوژ | - | - | - | - | ١ | ١ | - | - | - | - | - | - | ٢ |





| ز | جۆری ڕووداوەکانی کەرکوک لە ساڵی ( ٢٠٠٦ ) | کانوونی دووەم | شوبات | مارت | نیسان | مایس | حوزەیران | تەمووز | ئاب | ئەیلوول | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانوونی یەکەم | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ڕفاندن | ١٠ | ٣ | ٧ | ١٣ | ١١ | ٨ | - | - | - | - | - | - | ٢٥ |
| ٢ | گومان لێکردن | ٤ | ١٢ | ٨ | ١٢ | ٤ | ١٥ | - | - | - | - | - | - | ٥٧ |
| ٣ | دەستڕێژی گوللە | ٤٠ | ٢٦ | ٣٠ | ٢٧ | ٢٣ | ٢٧ | - | - | - | - | - | - | ١٧٣ |
| ٤ | تیرۆر | ١ | ٤ | - | ٤ | ١٠ | ٤ | - | - | - | - | - | - | ٢٣ |
| ٥ | دەستگیرکردن/ دەستگیرکراو | ١ | ٥ | - | ١ | ٢ | ١ | - | - | - | - | - | - | ١٠ |
| ٦ | تەقینەوە | ٢ | ٤ | ١ | - | ١ | - | - | - | - | - | - | - | ٨ |
| ٧ | تەقینەوەی ئۆتۆمبێلی بۆمبڕێژکراو/ماتۆڕ | ٨ | ٦ | ٢ | - | ١ | - | - | - | - | - | - | - | ١٧ |
| ٨ | تەقینەوەی بۆمب/نارنجۆک/قازیفە | ٧٣ | ٥٣ | ٧٧ | ١٠٢ | ٤٩ | ٧٩ | - | - | - | - | - | - | ٤٣٣ |
| ٩ | دزی و تاڵان | ٣ | ٢ | - | ٢ | - | - | - | - | - | - | - | - | ٧ |
| ١٠ | ڕووداوی هاتووچۆ/شێلان | ١٠ | ٨ | ١٢ | ١٣ | ٥ | ١١ | - | - | - | - | - | - | ٥٩ |
| ١١ | سووتان | ١٠ | ٥ | ٣ | ٣ | ٣ | ٣ | - | - | - | - | - | - | ٢٦ |
| ١٢ | ڕووداوی غاز و نەوت/بۆری نەوت | ١٦ | - | ١٨ | ١٦ | ٤ | ١٢ | - | - | - | - | - | - | ٦٦ |
| ١٣ | دۆزینەوەو دەستبەسەراگرتنی ئۆتۆمبێل | ١٣ | - | ١٥ | ١١ | ٦ | ٦ | - | - | - | - | - | - | ٥١ |
| ١٤ | کەوتنەوەی مووشەک و هاوەن و ڕووناککەرەوە | ٧ | - | ١٢ | ١١ | - | ١١ | - | - | - | - | - | - | ٤١ |
| ١٥ | دۆزینەوەی لاشە/منداڵی فڕێدراو | ٩ | ٨ | ٤ | - | ٧ | ٧ | - | - | - | - | - | - | ٣٥ |
| ١٦ | دۆزینەوەی مووشەک/قازیفە | ٨ | ٤ | ١١ | - | - | - | - | - | - | - | - | - | ٢٣ |
| ١٧ | دۆزینەوەی بۆمب/نارنجۆک | ٣٠ | ٣٥ | ٣٢ | ٤١ | ٣٠ | ٥١ | - | - | - | - | - | - | ٢١٩ |
| ١٨ | دۆزینەوەی ئامرازەکانی تەقینەوە | ١٠ | ٤ | ٧ | ٤ | ٤ | ٣ | - | - | - | - | - | - | ٣٣ |
| ١٩ | کوشتن | ١٣ | ٦ | ١٣ | ٨ | ٢ | ٥ | - | - | - | - | - | - | ٤٧ |
| ٢٠ | بەسەرددان | ١ | ٣ | ١ | ٥ | ٣ | ٥ | - | - | - | - | - | - | ١٨ |

| | | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢١ | شەڕو پێکدادان | ٢ | ٤ | ٤ | ٤ | ٤ | ٦ | - | - | - | - | - | - | ٢٤ |
| ٢٢ | خۆپیشاندان | ٤ | ٢ | ٢ | ١ | - | ١ | - | - | - | - | - | - | ١٠ |
| ٢٣ | مردن / بزربوون | ٢ | - | ١ | ٢ | ١ | ٢ | - | - | - | - | - | - | ٨ |
| ٢٤ | فڕێدانی نارنجۆك/قازیفە/ بۆمب | - | ٢ | - | ٦ | ٣ | ٤ | - | - | - | - | - | - | ١٣ |
| ٢٥ | هەڕەشە | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ٢٦ | دزینی ئۆتۆمبیل | - | ٦ | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | ٦ |
| ٢٧ | دۆزینەوەی ئۆتۆمبیلی بۆمب ڕێژكراو | - | ٢ | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | ٢ |
| ٢٨ | دۆزینەوەی بڵاوكراوە | - | - | ٣ | - | ١ | - | - | - | - | - | - | - | ٤ |
| ٢٩ | نوقم بوون لە ئاودا | - | - | ١ | ٢ | ١ | ٣ | - | - | - | - | - | - | ٧ |
| ٣٠ | خۆكوشتن / هەوڵدان بۆ خۆكوشتن | - | ١ | ١ | ٢ | - | ٣ | - | - | - | - | - | - | ٧ |
| ٣١ | تەقاندنەوەی خۆکوژ | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |





| ز | جۆری ڕووداوەکانی کەرکوك لە ساڵی ( ٢٠٠٧ ) | کانوونی دووەم | شوبات | مارت | نیسان | مایس | حوزەیران | تەمووز | ئاب | ئەیلوول | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانوونی یەکەم | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ڕفاندن | – | – | – | ١٠ | ١٤ | ١٢ | ١٥ | ٢٠ | ١٤ | – | – | – | ٨٥ |
| ٢ | گومان لێکردن | – | – | – | ٨ | ١٣ | ٧ | ٢٦ | ٣٢ | ١٧ | – | – | – | ١٠٣ |
| ٣ | دەستڕێژی گوللە | – | – | – | ٢٨ | ٣٠ | ٣١ | ٥٨ | ٤٩ | ٤١ | – | – | – | ٢٣٧ |
| ٤ | تیرۆر | – | – | – | – | – | ٢ | ١ | ١ | – | – | – | – | ٤ |
| ٥ | دەستگیرکردن/ دەستگیرکراو | – | – | – | ٣ | ٣ | ٨ | ٣ | – | ١ | – | – | – | ١٨ |
| ٦ | تەقینەوە | – | – | – | – | ١ | ٣ | ٢ | ١ | ١ | – | – | – | ٨ |
| ٧ | تەقینەوەی ئۆتۆمبێلی بۆمبڕێژکراو/ماتۆڕ | – | – | – | ٤ | ١ | ٢ | ٧ | ١٠ | ٥ | – | – | – | ٢٩ |
| ٨ | تەقینەوەی بۆمب/نارنجۆك/قازیفە | – | – | – | ٧٦ | ٩٥ | ١١٥ | ٧٩ | ٦٧ | ٩٧ | – | – | – | ٥٢٩ |
| ٩ | دزی و تاڵان | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – |
| ١٠ | ڕووداوی هاتووچۆ/شێلان | – | – | – | ٤ | ٧ | ٨ | ٨ | ٩ | ١٠ | – | – | – | ٤٦ |
| ١١ | سووتان | – | – | – | ١ | ٦ | ٤ | ٣ | ٢ | ١ | – | – | – | ١٧ |
| ١٢ | ڕووداوی غاز و نەوت/بۆری نەوت | – | – | – | ٣ | ٣ | ٣ | ٢ | ١ | – | – | – | – | ١٢ |
| ١٣ | دۆزینەوەو دەستبەسەراگرتنی ئۆتۆمبێل | – | – | – | ٨ | ١٤ | ١١ | ١٥ | – | – | – | – | – | ٤٨ |
| ١٤ | کەوتنەوەی مووشەك و هاوەن و ڕووناککەرەوە | – | – | – | ٣٠ | ٤٤ | ٣٩ | ٣٥ | ٧٢ | ٣٧ | – | – | – | ٢٥٧ |
| ١٥ | دۆزینەوەی لاشە/منداڵی فڕێدراو | – | – | – | ١٢ | ١٢ | ٦ | ١٤ | ١٥ | ٧ | – | – | – | ٦٦ |
| ١٦ | دۆزینەوەی مووشەك/قازیفە | – | – | – | ٢ | ٩ | ٥ | ٤٤ | ٤ | ٦ | – | – | – | ٧٠ |
| ١٧ | دۆزینەوەی بۆمب/نارنجۆك | – | – | – | ٤٤ | ٤٩ | ٥٧ | ٤٤ | ٤٣ | ٤٤ | – | – | – | ٢٨١ |
| ١٨ | دۆزینەوەی ئامرازەکانی تەقینەوە | – | – | – | ١٢ | ٤ | ٧ | ١ | ١٥ | ٣ | – | – | – | ٤٢ |
| ١٩ | کوشتن | – | – | – | ١٤ | ١٢ | ٧ | ١٠ | ١٣ | ٥ | – | – | – | ٦١ |
| ٢٠ | بەسەرهاتەکان | – | – | – | ٥ | ٨ | ١٢ | ١٦ | ٢٠ | ٢٤ | – | – | – | ٨٥ |

| | | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢١ | شەڕو پێکدادان | - | - | - | ٤ | ٥ | ٣ | ٢ | ٧ | ٥ | - | - | - | ٢٦ |
| ٢٢ | خۆپیشاندان | - | - | - | - | ٥ | - | ١ | ١ | - | - | - | - | ٧ |
| ٢٣ | مردن/ بزربوون | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ٢٤ | فرێدانی نارنجۆك/قازیفە/ بۆمب | - | - | - | ٣ | - | ٥ | ٦ | ١ | ٢ | - | - | - | ١٦ |
| ٢٥ | هەڕەشە | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ٢٦ | دزینی ئۆتۆمبیل | - | - | - | - | - | - | - | ١٥ | ١٧ | - | - | - | ٣٢ |
| ٢٧ | دۆزینەوەی ئۆتۆمبیلی بۆمب ڕێژکراو | - | - | - | - | - | - | ١ | - | ١ | - | - | - | ٢ |
| ٢٨ | دۆزینەوەی بڵاوکراوە | - | - | - | ٧ | ١ | ٣ | ٢ | ٢ | - | - | - | - | ١٥ |
| ٢٩ | نوقم بوون لە ئاودا | - | - | - | - | ١ | - | ١ | ١ | ١ | - | - | - | ٤ |
| ٣٠ | خۆکوشتن / هەوڵدان بۆ خۆکوشتن | - | - | - | - | - | - | - | ٣ | ١ | - | - | - | ٤ |
| ٣١ | تەقاندنەوەی خۆکوژ | - | - | - | - | - | ٢ | - | - | - | - | - | - | ٢ |

| ز | جۆری ڕووداوەکانی کەرکوك لە ساڵی ( ٢٠٠٨ ) | کانوونی دووەم | شوبات | مارت | نیسان | مایس | حوزەیران | تەمووز | ئاب | ئەیلوول | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانوونی یەکەم | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ڕفاندن | ٩ | ٨ | ١٠ | ٣ | ٥ | ٤ | ٢ | ٢ | ٦ | ١٠ | ٤ | ٤ | ٦٧ |
| ٢ | گومان لێکردن | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ٣ | دەستڕێژی گوللە | ١٧ | ٢٢ | ١٦ | ٢٠ | ١١ | ١٣ | ١٢ | ١١ | ١٢ | ١١ | ١٤ | ٨ | ١٥٧ |
| ٤ | تیرۆر | - | - | ٢ | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ٥ | دەستگیرکردن/ دەستگیرکراو | ١٠ | ٢ | ٣ | ١١ | ٥ | ٩ | ٣ | ١٠ | ٤ | ٨ | ٦ | ١٢ | ٨٦ |
| ٦ | تەقینەوە | ٣ | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | ٣ |
| ٧ | تەقینەوەی ئۆتۆمبێلی بۆمبڕێژکراو/ماتۆڕ | ٢٩ | ٥ | ٤ | ١ | ٣ | ١ | - | ١ | ١ | - | - | - | ٤٤ |
| ٨ | تەقینەوەی بۆمب/نارنجۆك/قازیفە | ١ | ٢٧ | ٢٩ | ٢٩ | ٣٠ | ٢٦ | ٣٤ | ٣٣ | ٢٩ | ١٧ | ٢٢ | ١٩ | ٢٩٦ |
| ٩ | دزی و تاڵان | ١٤ | - | - | - | - | - | - | ١ | - | - | ٢ | - | ١٧ |
| ١٠ | ڕووداوی هاتووچۆ/شێلان | ٢ | ١٣ | ١٦ | ١٢ | ١٩ | ١٥ | ١٠ | ٤ | ١٥ | ٢٠ | ١٨ | ٢٤ | ١٦٨ |
| ١١ | سووتان | - | ٢ | ٤ | ٢ | ٣ | ٧ | ٦ | ١١ | ١ | ٤ | ٥ | ٧ | ٥٢ |
| ١٢ | ڕووداوی غاز و نەوت/بۆری نەوت | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ١٣ | دۆزینەوەو دەستبەسەراگرتنی ئۆتۆمبێل | ١٨ | ٦ | ٧ | ٤ | ٨ | ٢ | ٤ | - | ٢ | ١ | ٢ | ٥ | ٥٩ |
| ١٤ | کەوتنەوەی مووشەك و هاوەن و ڕووناککەرەوە | ٣ | ١٩ | ١٦ | ١١ | ١٠ | ١٠ | ١٨ | ١٧ | ١٩ | ٧ | ٦ | ٢٠ | ١٤٦ |
| ١٥ | دۆزینەوەی لاشە/منداڵی فڕێدراو | ٧ | ٥ | ٨ | ٨ | ٢ | ١ | ٣ | ٧ | ٢ | ٦ | ٤ | ٤ | ٥٧ |
| ١٦ | دۆزینەوەی مووشەك/قازیفە | ٣٩ | ٩ | ١٢ | ٨ | ١١ | ٦ | ١٦ | ١٢ | ١٠ | ٧ | ١٠ | ١٠ | ١٥٠ |
| ١٧ | دۆزینەوەی بۆمب/نارنجۆك | ٥ | ٣٣ | ٢٩ | ٣٣ | ٢١ | ٢١ | ١٨ | ٢٣ | ٢٣ | ٢٤ | ٣٠ | ١٨ | ٢٧٨ |
| ١٨ | دۆزینەوەی ئامرازەکانی تەقینەوە | ٢ | ١١ | ٧ | - | ٤ | - | ٢ | ٥ | ١ | ٨ | ٦ | ٦ | ٥٢ |
| ١٩ | کوشتن | ١٧ | - | - | ٣ | ٥ | ٦ | ٤ | ٦ | ٧ | ٤ | ٣ | ٢ | ٤٦ |
| ٢٠ | بەسەردادان | ١ | ١٧ | ١٨ | ١٦ | ٢٣ | ١٧ | ١٠ | ١١ | ٥ | ٦ | ١٢ | ١٥ | ١٤١ |

| | | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢١ | شەڕو پێکدادان | ٣ | ٤ | ٤ | ٨ | ٤ | ٥ | ٦ | ٥ | ٨ | ٧ | ٤ | ٤ | ٦٢ |
| ٢٢ | خۆپیشاندان | ٢ | ٨ | ٥ | ١ | ٣ | ٤ | ٤ | ٢ | – | ٢ | ٣ | ٧ | ٤١ |
| ٢٣ | مردن/ بزربوون | – | – | – | ١ | ٢ | – | ١ | ١ | ١ | ١ | – | – | ٧ |
| ٢٤ | فڕێدانی نارنجۆك/قازیفە/ بۆمب | ٢ | ١ | ٣ | ١ | – | ١ | ٢ | ١ | ٥ | ٣ | ١ | ٢ | ٢٢ |
| ٢٥ | هەڕەشە | – | – | – | – | – | – | ١ | – | – | – | – | – | – |
| ٢٦ | دزینی ئۆتۆمبیل | ٩ | ٢ | ٢ | ١ | ٢ | – | – | ٦ | ٦ | ٣ | ٤ | ١٠ | ٤٥ |
| ٢٧ | دۆزینەوەی ئۆتۆمبیلی بۆمب ڕێژکراو | – | ١ | ١ | ١ | – | ٩ | ١ | – | – | – | – | – | ١٣ |
| ٢٨ | دۆزینەوەی بلاوکراوە | – | ١ | ٤ | – | – | ١ | ١ | ٣ | ١ | ٣ | – | ٥ | ١٩ |
| ٢٩ | نوقم بوون لە ئاودا | – | – | ١ | ٢ | ١ | ١ | ١ | – | ٢ | – | – | – | ٨ |
| ٣٠ | خۆکوشتن / هەوڵدان بۆ خۆکوشتن | ٢ | – | ٢ | ٢ | – | ٢ | ٢ | ٢ | ١ | ١ | ١ | ١ | ١٦ |
| ٣١ | تەقاندنەوەی خۆکوژ | – | – | ١ | – | – | – | ١ | ١ | – | – | – | ٢ | ٥ |





| ز | جۆری ڕووداوەکانی کەرکوک لە ساڵی ( ٢٠٠٩ ) | کانوونی دووەم | شوبات | مارت | نیسان | مایس | حوزەیران | تەمموز | ئاب | ئەیلول | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانوونی یەکەم | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ڕفاندن | ٣ | ٤ | ٣ | ٣ | ٦ | - | ١٠ | ٧ | ٥ | ٨ | ٣ | ٥ | ٦٧ |
| ٢ | گومان لێکردن | ٧ | ١٢ | ١٠ | ٧ | ٥ | ٣ | ١٤ | ١٣ | ٥ | ١ | ٣ | ٤ | ٨٤ |
| ٣ | دەستڕێژی گوللە | ١١ | ١١ | ١٧ | ١٥ | ١٣ | ٧ | ١٠ | ١٧ | ١٢ | ٤ | ٩ | - | ١٢٦ |
| ٤ | تیرۆر | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ٥ | دەستگیرکردن/ دەستگیرکراو | ١ | ٩ | ١٩ | ٧ | ٤ | ٢ | ٥ | ٢٠ | ٣ | ١٥ | ١٨ | ١٧ | ١٢٠ |
| ٦ | تەقینەوە | - | - | - | - | - | - | - | ١ | - | - | - | - | - |
| ٧ | تەقینەوەی ئۆتۆمبێلی بۆمبڕێژکراو/ماتۆڕ | - | - | ١ | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ | ٣ | ١ | - | ٢ | ٢ | ١٧ |
| ٨ | تەقینەوەی بۆمب/نارنجۆک/قازیفە | ١٨ | ١٣ | ١٦ | ١٦ | ٢٠ | ١٩ | ١٨ | ٢٥ | ٢٧ | ١٥ | ١٠ | ٢٦ | ٢٢٣ |
| ٩ | دزی و تاڵان | ٣ | ٢ | ٢ | ٣ | ٢ | ٢ | ١ | - | ٢٦ | ١٧ | ٢٧ | ٢٢ | ١٠٥ |
| ١٠ | ڕووداوی هاتووچۆ/شێلان | ١٥ | ٢٣ | ١٥ | ١٩ | ١٨ | ١٦ | ١٤ | ٢٠ | ٢٠ | ٢٥ | ٢٩ | ١٧ | ٢٣١ |
| ١١ | سووتان | ٨ | ٧ | ٥ | ٣ | ٣ | ٤ | ٧ | ٣ | ٣ | ٥ | ٧ | - | ٥٥ |
| ١٢ | ڕووداوی غاز و نەوت/بۆری نەوت | ١ | - | ٣ | ١ | - | - | - | - | - | - | - | - | ٥ |
| ١٣ | دۆزینەوەو دەستبەسەراگرتنی ئۆتۆمبێل | - | - | ١ | ٣ | - | ٣ | ٦ | ٣ | ١ | ٣ | ١ | ٢ | ١٧ |
| ١٤ | کەوتنەوەی مووشەک و هاوەن و ڕووناککەرەوە | ٩ | ١٥ | ٥ | ٧ | ٢ | ٧ | ١٢ | ٤ | ٢٠ | ٨ | ٥ | ١٢ | ١٠٦ |
| ١٥ | دۆزینەوەی لاشە/منداڵی فڕێدراو | ٣ | - | ٣ | - | ٤ | ١ | ٤ | ٣ | ٣ | ٣ | - | ٣ | ٢٧ |
| ١٦ | دۆزینەوەی مووشەک/قازیفە | ١٥ | ١٣ | ٢١ | - | ٥ | ٤ | ٢ | ٧ | ٤ | ٦ | - | ٨ | ٨٥ |
| ١٧ | دۆزینەوەی بۆمب/نارنجۆک | ١٠ | ٢٠ | ١٦ | ٤٤ | ٢٨ | - | ١٣ | ١٢ | - | ١١ | ١٠ | ١٠ | ١٧٤ |
| ١٨ | دۆزینەوەی ئامرازەکانی تەقینەوە | ١ | ١ | ٨ | ٦ | ٥ | ٢٣ | ٨ | - | ٣ | - | ١ | - | ٥٦ |
| ١٩ | کوشتن | ٦ | ٤ | ١٤ | ٣ | ٦ | ٢ | ٧ | ٥ | ٤ | ٣ | ٥ | ٣ | ٦٢ |
| ٢٠ | بەسەردادان | ١٠ | ٨ | ١٩ | ١٦ | ١٦ | ١٩ | ٩ | ٢٣ | ١٥ | ١٤ | ٩ | ٥ | ١٦٣ |

| | | | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢١ | شەڕو پێکدادان | | ٤ | ٢ | ١١ | ٤ | ٧ | ٦ | ٣ | ٦ | ٧ | ٥ | ٥ | ٤ | ٦٤ |
| ٢٢ | خۆپیشاندان | | ٤ | - | ١ | - | - | ٤ | ٣ | ٢ | ٤ | ٦ | ٤ | ٧ | ٣١ |
| ٢٣ | مردن/ بزربوون | | - | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ | - | ١ | - | ٣ | - | - | ١ | ١٢ |
| ٢٤ | فڕێدانی نارنجۆک/قازیفە/ بۆمب | | ٤ | ٧ | ٦ | ٨ | ٤ | ٥ | ٣ | ٦ | ١١ | ٣ | ٣ | ٤ | ٦٤ |
| ٢٥ | هەڕەشە | | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ٢٦ | دزینی ئۆتۆمبیل | | ٦ | ٢ | ٤ | ٩ | ٤ | ٢ | ١ | ٥ | ٤ | ٣ | - | - | ٣٤ |
| ٢٧ | دۆزینەوەی ئۆتۆمبیلی بۆمب ڕێژکراو | | ٤ | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | ٤ |
| ٢٨ | دۆزینەوەی بڵاوکراوە | | ٣ | ٣ | ١ | ٢ | ٤ | - | ٢ | ١ | ١ | - | - | ١ | ١٨ |
| ٢٩ | نوقم بوون لە ئاودا | | - | - | ٣ | - | ٢ | - | - | ٢ | ٢ | - | - | - | ٩ |
| ٣٠ | خۆکوشتن / هەوڵدان بۆ خۆکوشتن | | ٢ | - | - | ٢ | - | ٢ | ٢ | - | - | ٤ | ٤ | ٣ | ١٩ |
| ٣١ | تەقاندنەوەی خۆکوژ | | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |





| ز | جۆری ڕووداوەکانی کەرکوك لە ساڵی ( ٢٠١٠ ) | کانوونی دووەم | شوبات | مارت | نیسان | مایس | حوزەیران | تەمووز | ئاب | ئەیلوول | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانوونی یەکەم | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ڕفاندن | ٤ | ٢ | ٣ | ١ | ٢ | ٢ | – | ٧ | ٣ | ٥ | ٤ | ٤ | ٣٧ |
| ٢ | گومان لێکردن | ٣ | ٢ | ٣ | ١٠ | ٤ | ٢ | ٥ | ٤ | ٢ | ١ | ٤ | – | ٤٠ |
| ٣ | دەستڕێژی گولله | ١١ | ٨ | ١٤ | ٦ | ٦ | ٨ | ١٠ | ٦ | ٢ | ٨ | ٦ | ٣ | ٨٨ |
| ٤ | تیرۆر | – | – | – | – | – | – | ٣ | – | – | – | – | – | ٣ |
| ٥ | دەستگیرکردن/ دەستگیرکراو | ١١ | ٤ | ٩ | ١٠ | ١٢ | ٢٦ | ٢١ | ٢١ | ٦ | ١٠ | ١٩ | ١٧ | ١٦٦ |
| ٦ | تەقینەوە | – | – | – | ١ | – | – | – | – | – | – | – | – | ١ |
| ٧ | تەقینەوەی ئۆتۆمبێلی بۆمبڕێژکراو/ماتۆڕ | – | – | ١ | – | – | – | ٢ | ٢ | ٢ | – | ٥ | – | ١٢ |
| ٨ | تەقینەوەی بۆمب/نارنجۆك/قازیفە | ١٥ | ١٦ | ٢٠ | ٢٠ | ١٥ | ١١ | ٩ | ١٠ | ١٤ | ١٣ | ١٢ | ٨ | ١٦٣ |
| ٩ | دزی و تاڵان | ٣٣ | ٤٣ | ٤٣ | ٣١ | ١٣ | ٢٧ | ١٧ | ٢٢ | ٣١ | ٢٦ | ٣٢ | ٢٧ | ٢٤٥ |
| ١٠ | ڕووداوی هاتووچۆ/شێلان | ٢١ | ١٣ | ٣١ | ٢٥ | ١٧ | ٢٥ | ٣٦ | ٢٢ | ٢٢ | ١٣ | ٢٦ | ٢١ | ٢٧٢ |
| ١١ | سووتان | ٥ | – | ٣ | ١ | ٧ | ٦ | ١٠ | ٧ | ٢ | ٣ | – | ١ | ٤٥ |
| ١٢ | ڕووداوی غاز و نەوت/بۆری نەوت | – | – | ١ | – | – | ١ | – | – | – | – | – | – | ٢ |
| ١٣ | دۆزینەوەو دەستبەسەراگرتنی ئۆتۆمبێل | ١ | – | ٥ | ٣ | ٣ | ١ | ٦ | ١ | ٥ | ١ | ١ | ٤ | ٣١ |
| ١٤ | کەوتنەوەی مووشەك و هاوەن و ڕووناککەرەوە | ٦ | ١٥ | ١٠ | ٩ | ١٨ | ١٤ | ١٧ | ١٠ | ٥ | ٢٠ | ١٢ | ١٨ | ١٥٤ |
| ١٥ | دۆزینەوەی لاشە/منداڵی فڕێدراو | ٥ | ٢ | ١ | ١ | ٢ | ٦ | ٣ | ١ | ٤ | – | ٢ | ٤ | ٣١ |
| ١٦ | دۆزینەوەی مووشەك/قازیفە | ٤ | ١١ | ١١ | ٤ | ٦ | ٣ | ١ | ٤ | ٥ | ١٢ | ٧ | ٢ | ٧٠ |
| ١٧ | دۆزینەوەی بۆمب/نارنجۆك | ١٥ | ٦ | ١٦ | ٧ | ١٣ | ٨ | ١١ | ٧ | ٥ | ١ | ١٧ | ١٤ | ١٢٠ |
| ١٨ | دۆزینەوەی ئامرازەکانی تەقینەوە | ٧ | ٥ | – | ٣ | ٧ | ٨ | ٥ | ٧ | ٧ | ٢٣ | ٤ | ٩ | ٨٥ |
| ١٩ | کوشتن | ٢ | – | ٤ | – | ٧ | ١ | ٢ | ٧ | ٣ | ٣ | ٢ | ٦ | ٣٧ |
| ٢٠ | بەسەرردادان | ١٩ | ٣٣ | ١٦ | ٢١ | ١٢ | ١٤ | ٢٧ | ١٢ | ٢٣ | ٢٥ | ٢٤ | ٢٢ | ٢٢٩ |

| ٢١ | شەڕو پێکدادان | ٦ | ١٢ | ١٦ | ٤ | ٨ | ٧ | ١١ | ١٢ | ٢ | ٩ | ١٠ | ١٠ | ١٠٧ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢٢ | خۆپیشاندان | ٢ | ١ | ٣ | ١ | ٥ | ٣ | ٧ | ٩ | ٢ | ٣ | ٣ | ٣ | ٤٣ |
| ٢٣ | مردن/ بزربوون | – | – | ١ | – | ٢ | – | ٤ | – | – | – | – | – | ٧ |
| ٢٤ | فڕێدانی نارنجۆك/قازیفە/ بۆمب | ٤ | ١ | ٥ | ٤ | ٣ | ٢ | ١ | – | ٣ | ٥ | ٢ | ٢ | ٣٢ |
| ٢٥ | هەڕەشە | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – |
| ٢٦ | دزینی ئۆتۆمبیل | ٢ | – | ١ | ٣ | ٤ | ٣ | ٦ | ٨ | ٥ | ٤ | – | ٢ | ٣٨ |
| ٢٧ | دۆزینەوەی ئۆتۆمبیلی بۆمب ڕێژکراو | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – |
| ٢٨ | دۆزینەوەی بڵاوکراوە | ١ | ٢ | ٢ | – | – | – | – | – | – | ٣ | ١ | – | ٩ |
| ٢٩ | نوقم بوون لە ئاودا | – | – | ١ | ١ | ١ | – | ٣ | ٤ | ١ | ٤ | – | – | ١٤ |
| ٣٠ | خۆکوشتن / هەوڵدان بۆ خۆکوشتن | ٣ | ٢ | ٢ | ١ | ٢ | ١ | ٣ | ٥ | ١ | – | – | ١ | ٢١ |
| ٣١ | تەقاندنەوەی خۆکوژ | – | – | ١ | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ١ |





| ژ | جۆری ڕووداوەکانی کەرکوك لە ساڵی ( ٢٠١١ ) | کانوونی دووەم | شوبات | مارت | نیسان | مایس | حوزەیران | تەمووز | ئاب | ئەیلوول | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانوونی یەکەم | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ڕفاندن | ١ | ٩ | ٤ | ٥ | ١١ | ١١ | ١٠ | ٢ | ٦ | ٥ | ٦ | ٣ | ٧٣ |
| ٢ | گومان لێکردن | ٢ | ٢ | - | ٢ | ١ | ١ | - | - | - | - | - | - | ٨ |
| ٣ | دەستڕێژی گوللە | ٧ | ٥ | ٤ | ٦ | - | ٦ | ١٤ | ٥ | ٤ | ٦ | ٤ | ٧ | ٦٨ |
| ٤ | تیرۆر | - | - | - | ٢ | - | - | - | - | ١ | - | - | - | ٢ |
| ٥ | دەستگیرکردن/ دەستگیرکراو | ١٣ | ١٣ | ١٨ | ١٥ | ١٠ | ١٠ | ١٨ | ١٢ | ١٢ | ١ | ١١ | - | ١٣٣ |
| ٦ | تەقینەوە | - | - | - | - | - | - | ١ | - | - | - | - | - | ١ |
| ٧ | تەقینەوەی ئۆتۆمبێلی بۆمبڕێژکراو/ماتۆڕ | - | ٣ | ٢ | ٢ | ١ | ١ | - | ٣ | - | - | ٢ | ١ | ١٥ |
| ٨ | تەقینەوەی بۆمب/نارنجۆك/قازیفە | ٥ | ٩ | ٦ | ٢١ | ١٣ | ١٣ | ١٤ | ٢٧ | ١٥ | ٢١ | ١٨ | ٣٠ | ١٩٢ |
| ٩ | دزی و تاڵان | ٣٠ | ٣٣ | ٥٦ | ٣٦ | ٤٢ | ٤٢ | ٣١ | ٣٣ | ٤٦ | - | ٣٥ | ٢٦ | ٣٤٩ |
| ١٠ | ڕووداوی هاتووچۆ/شێلان | ٢٤ | ١٦ | ٢١ | ٢٣ | ١٣ | ١٣ | ٢٠ | ٢٠ | ٣٥ | ١٧ | ٢٩ | ٢٥ | ٣١١ |
| ١١ | سووتان | ٥ | ١ | ٣ | ٢ | ٨ | ٨ | ٧ | - | ١ | ٢ | ٢ | - | ٤١ |
| ١٢ | ڕووداوی غاز و نەوت/بۆری نەوت | - | - | ١ | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ١٣ | دۆزینەوەو دەستبەسەراگرتنی ئۆتۆمبێل | ٣ | ٢ | ٣ | ٢ | ٤ | ٥ | ١ | ٥ | ٦ | ٢ | ١٠ | ٦ | ٣٩ |
| ١٤ | کەوتنەوەی مووشەك و هاوەن و ڕووناککەرەوە | ١٨ | ٨ | ١٤ | ١٥ | ١٨ | ١٨ | ١٤ | ١٥ | ١٤ | ٨ | ٨ | ١٠ | ١٦٠ |
| ١٥ | دۆزینەوەی لاشە/منداڵی فڕێدراو | ٢ | ٥ | ٢ | ٧ | ٣ | ٣ | ٤ | ٥ | ٤ | ١ | - | ٣ | ٣٩ |
| ١٦ | دۆزینەوەی مووشەك/قازیفە | ٣ | ٥ | ٣ | ٣ | ٣ | ٣ | ٢ | ٣ | ٢ | - | ٧ | ٣ | ٣٧ |
| ١٧ | دۆزینەوەی بۆمب/نارنجۆك | ٩ | ٦ | ١ | ٨ | ١٤ | ١٤ | ١٨ | ١٧ | ٦ | ٥ | ٩ | - | ١٠٧ |
| ١٨ | دۆزینەوەی ئامرازەکانی تەقینەوە | ٩ | ١٤ | ١٤ | ٨ | ١١ | ١١ | ١ | ٣ | ٢٤ | ٢٠ | ١ | ٤ | ١٢٠ |
| ١٩ | کوشتن | ٤ | ٢ | ٢ | ٥ | ٣ | ٣ | ٨ | ٥ | ٨ | ٣ | - | ٢ | ٣٧ |
| ٢٠ | بەسەردادان | ٢٢ | ١٣ | ١٤ | ٢ | ٢٨ | ٢٨ | ٢٩ | ١٧ | ١٩ | ١٨ | ٧ | ١٧ | ٢٤٢ |

|  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢١ | شەرو پێكدادان | ١٠ | ٥ | ١٠ | ١٧ | ٩ | ٩ | ١٣ | ٣ | ١٠ | ٧ | ٧ | ٧ | ١٠٧ |
| ٢٢ | خۆپیشاندان | ٥ | ١٨ | ٨ | ٦ | ١٣ | ١٣ | ٧ | ٦ | ٨ | ٢١ | ٦ | ٨ | ١١٩ |
| ٢٣ | مردن/ بزربوون | ١ | ٣ | - | - | - | - | - | ١ | - | - | ٢ | - | ٧ |
| ٢٤ | فرێدانی نارنجۆك/قازیفە / بۆمب | ١ | ١ | - | - | - | - | ٢ | - | - | ٤ | ٤ | ٢ | ١٤ |
| ٢٥ | هەرەشە | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ٢٦ | دزینی ئۆتۆمبیل | ٥ | ٦ | ٣ | ٩ | ٨ | ٩ | ٢ | ٦ | ١٧ | ٢٤ | ٤ | ٣ | ٩٩ |
| ٢٧ | دۆزینەوەی ئۆتۆمبیلی بۆمب رێژكراو | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ٢٨ | دۆزینەوەی بڵاوكراوە | ١ | ٧ | - | - | ١ | ١ | - | ٣ | ١ | ١ | ٢ | ٢ | ١٩ |
| ٢٩ | نوقم بوون لە ئاودا | - | - | ١ | ٤ | ٢ | ٢ | ٥ | ١ | ١ | ١ | ١ | - | ١٨ |
| ٣٠ | خۆكوشتن / هەوڵدان بۆ خۆكوشتن | ١ | ٣ | ٣ | ٥ | - | ١ | ٤ | ٤ | ١ | ١ | ٢ | ٥ | ٣٠ |
| ٣١ | تەقاندنەوەی خۆكوژ | - | - | - | - | - | ٢ | - | - | - | - | - | - | ٢ |





| ز | جۆری ڕووداوەکانی کەرکوك لە ساڵی (٢٠١٢) | کانوونی دووەم | شوبات | مارت | نیسان | مایس | حوزەیران | تەمووز | ئاب | ئەیلوول | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانوونی یەکەم | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ڕفاندن | ٥ | ٤ | ٤ | ٥ | ٥ | ٤ | ٣ | ٩ | - | ٥ | - | - | ٣٥ |
| ٢ | گومان لێکردن | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ٣ | دەستڕێژی گوللە | ١٤ | ٧ | ٨ | ٨ | ٧ | ٢ | ٧ | ٨ | ٩ | ٩ | ٦ | ٨ | ٩٣ |
| ٤ | تیرۆر | - | - | - | - | - | - | - | - | ١ | - | - | - | - |
| ٥ | دەستگیرکردن/ دەستگیرکراو | ٢١ | ٦ | ١٦ | ١٩ | ١٣ | ٦ | ١٠ | ٨ | ١٣ | ١٨ | ١٣ | ١٣ | ٩٣ |
| ٦ | تەقینەوە | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ٧ | تەقینەوەی ئۆتۆمبێلی بۆمبڕێژکراو/ماتۆڕ | ٣ | ٤ | ٣ | ٣ | ١ | ٥ | ٨ | ٥ | ١٠ | ٧ | ٨ | ٣ | ٦٠ |
| ٨ | تەقینەوەی بۆمب/نارنجۆك/قازیفە | ٣١ | ٢٨ | ١٧ | ٢١ | ٣٣ | ١٤ | ٢٩ | ٢٦ | - | ٢٩ | ٣٣ | ٢٨ | ٢٨٩ |
| ٩ | دزی و تاڵان | ٢١ | ٢٠ | ٥ | ٢ | ٢ | - | ٦ | ٩ | ٢ | ٢ | ٢ | ٤ | ٧٥ |
| ١٠ | ڕووداوی هاتووچۆ/شێلان | ٢٩ | ١ | ٢٠ | ٢٢ | ٢٢ | ٢٥ | ٢٣ | ٢٢ | ١٦ | ٥ | ٢٣ | ١٦ | ٢٠٢ |
| ١١ | سووتان | ٣ | - | ١ | ٤ | ٢ | - | ٥ | ١ | ٢ | ١ | ١ | - | ٢٠ |
| ١٢ | ڕووداوی غاز و نەوت/بۆری نەوت | - | ١ | ١ | - | - | - | - | - | - | - | - | - | ٢ |
| ١٣ | دۆزینەوەو دەستبەسەراگرتنی ئۆتۆمبێل | ١ | ١١ | ١ | ٤ | ٣ | ٥ | ٣ | ١ | ١٦ | ٣ | ٥ | - | ٥٣ |
| ١٤ | کەوتنەوەی مووشەك و هاوەن و ڕووناککەرەوە | ١٠ | ٤ | ١٠ | ٧ | ١٤ | ٩ | ٨ | ٩ | ١١ | ٧ | ٧ | ١١ | ١٠٧ |
| ١٥ | دۆزینەوەی لاشە/منداڵی فڕێدراو | ٢ | ٣ | ٢ | ٥ | ٢ | ٢ | ٣ | ٤ | ٢ | - | ١ | ٢ | ٢٨ |
| ١٦ | دۆزینەوەی مووشەك/قازیفە | ٢ | ١٤ | ٥ | ٣ | ٢ | ٨ | - | ١ | ٢ | ٦ | - | ٢ | ٤٦ |
| ١٧ | دۆزینەوەی بۆمب/نارنجۆك | ٥ | ٦ | ١٥ | ١١ | ١٢ | ١٤ | ١٧ | ١٧ | ١٣ | ١٢ | ١٣ | ١٩ | ١٥٤ |
| ١٨ | دۆزینەوەی ئامرازەکانی تەقینەوە | ١٦ | ١ | ١٠ | ١٣ | ١٢ | ١١ | ٤ | ٧ | ١٠ | ٦ | ١٥ | ٥ | ١١٠ |
| ١٩ | کوشتن | ٤ | ١١ | ٥ | ٨ | ١ | ٤ | - | ٤ | ١٠ | ٢ | ٢ | ٥ | ٥٦ |
| ٢٠ | بەسەردادان | ١١ | ٦ | ٣٢ | ١٥ | ١١ | ١٥ | ١٨ | ٢٢ | ١٢ | ١٥ | ٨ | ٧ | ١٧٨ |

| | | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢١ | شەرو پێکدادان | - | ١١ | ١٠ | ١١ | ٨ | ٩ | - | ٤ | ٧ | ٦ | ٧ | ٥ | ٧٨ |
| ٢٢ | خۆپیشاندان | ١١ | ١ | ٩ | ٥ | ١٣ | ٨ | ٧ | ٤ | ٨ | ٦ | ٢٠ | - | ٩٢ |
| ٢٣ | مردن/ بزربوون | - | - | ٣ | - | - | - | - | - | - | ٢ | - | - | ٥ |
| ٢٤ | فرێدانی نارنجۆك/قازیفە/ بۆمب | - | - | ١ | ١ | - | ١ | - | ٢ | - | ١ | - | - | ٥ |
| ٢٥ | هەرەشە | - | ٣ | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | ٣ |
| ٢٦ | دزینی ئۆتۆمبیل | ٣ | - | ١ | ٥ | ٢ | ٧ | ٦ | ١٠ | ١١ | - | ٣ | ٤ | ٥٢ |
| ٢٧ | دۆزینەوەی ئۆتۆمبیلی بۆمب ڕێژکراو | - | ١ | - | - | - | - | - | - | - | ٦- | - | - | ٦ |
| ٢٨ | دۆزینەوەی بلاوکراوە | ٢ | - | ٢ | ١ | ٢ | ٣ | - | - | ٢ | - | ١ | - | ١٣ |
| ٢٩ | نوقم بوون لە ئاودا | - | ٢ | ١ | ٣ | - | - | ٢ | - | - | - | - | - | ٨ |
| ٣٠ | خۆکوشتن / هەوڵدان بۆ خۆکوشتن | ١ | ١ | - | ١ | - | ٣ | ٢ | ٢ | ٣ | - | ٢ | ٣ | ١٥ |
| ٣١ | تەقاندنەوەی خۆکوژ | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |





| ز | جۆری ڕووداوەکانی کەرکوك لە ساڵی ( ٢٠١٣ ) | کانوونی دووەم | شوبات | مارت | نیسان | مایس | حوزەیران | تەمووز | ئاب | ئەیلوول | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانوونی یەکەم | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | رفاندن | ٥ | ٤ | ٣ | ٣ | ١ | ٥ | ٣ | ٢ | ٢ | ٣ | ٣ | ٢ | ٣٦ |
| ٢ | گومان لێکردن | - | - | - | ١ | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ٣ | دەستڕێژی گولله | ٧ | ١٣ | ١٢ | ١٩ | ٩ | ١٧ | ٢٣ | ١٦ | ١٨ | ١٣ | ١٥ | ١٦ | ١٧٨ |
| ٤ | تیرۆر | - | - | - | - | ٣ | - | ١ | - | ٢ | - | - | - | ٩ |
| ٥ | دەستگیرکردن/ دەستگیرکراو | ١٢ | ١١ | ٤ | ٢١ | ٢١ | ١٧ | ٦ | ١٨ | ٩ | ١١ | ١١ | ٨ | ١٤٩ |
| ٦ | تەقینەوە | - | - | - | - | - | - | - | - | - | ١ | - | - | - |
| ٧ | تەقینەوەی ئۆتۆمبێلی بۆمبڕێژکراو/ماتۆر | ٣ | ٦ | ٧ | ٧ | ٤ | ٥ | ١٠ | ٦ | ١٣ | ١ | ٤ | ٣ | ٦٩ |
| ٨ | تەقینەوەی بۆمب/نارنجۆك/قازیفە | ٣٦ | ٣١ | ٤٧ | ٣٦ | ٤٩ | ٣١ | ٣٩ | ٢٩ | ٤٣ | ٦٥ | ٦٣ | ٦٣ | ٥٠٣ |
| ٩ | دزی و تاڵان | ٦ | ٢ | ٤ | ٤ | ١ | - | - | ٣ | ١ | ٣ | - | - | ٢٤ |
| ١٠ | ڕووداوی هاتووچۆ/شێلان | ١٣ | ١٥ | ٣١ | ٧ | ١٢ | ١٥ | ١٢ | ١٧ | ١٥ | ١٨ | ١٢ | ٦ | ١٧٣ |
| ١١ | سووتان | - | ٤ | ١ | ٢ | ٣ | - | ٣ | - | - | ٢ | ١ | ٣ | ١٩ |
| ١٢ | ڕووداوی غاز و نەوت/بۆری نەوت | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - | ١ | - | - |
| ١٣ | دۆزینەوەو دەستبەسەراگرتنی ئۆتۆمبێل | ٢ | ٣ | ١ | ٥ | ٢ | ٢ | ٧ | ٣ | ٣ | ٤ | ٣ | ٢ | ٣٧ |
| ١٤ | کەوتنەوەی مووشەك و هاوەن و رووناککەرەوە | ١٨ | ٢٤ | ٧ | ٩ | ١٤ | ٤ | ٩ | ١١ | ١٠ | - | ٩ | ٤ | ١١٩ |
| ١٥ | دۆزینەوەی لاشە/منداڵی فڕێدراو | ٣ | ٧ | ٢ | ٥ | ٢ | ٣ | ٣ | - | - | ٧ | ٣ | ٥ | ٦٠ |
| ١٦ | دۆزینەوەی مووشەك/قازیفە | ٦ | - | ٨ | ٢ | ٤ | ١ | ٢ | - | ٣ | ١ | ١ | ٤ | ٣٢ |
| ١٧ | دۆزینەوەی بۆمب/نارنجۆك | ١٥ | ٢٦ | ٢٢ | ١٥ | ٢٦ | ٢٣ | ١٧ | - | ٢٤ | ٢٤ | ٢٣ | ٢٦ | ٢٤١ |
| ١٨ | دۆزینەوەی ئامرازەکانی تەقینەوە | ٦ | ٩ | ١٣ | ٨ | ٥ | ٣ | ٣ | - | ٥ | ٧ | ٤ | ٧ | ٧٠ |
| ١٩ | کوشتن | ٢ | ٥ | ٨ | - | ٤ | ٤ | ٣ | ٧ | ٦ | ٣ | - | ٥ | ٤٧ |
| ٢٠ | بەسەردادان | ٧ | ٦ | ٦ | ٧ | ١٠ | ٨ | ٨ | ١٥ | ١٣ | ٢٢ | ١٤ | ١٥ | ١٣١ |

*** موجاهیدینی خەڵقی ئێران رۆڵی لە سەركوتكردنی راپەڕینی ١٩٩١دا:-**
**مۆفەق میراودەلی**

*** ئازادكردنی شاری كفری**

شاری كفری مێژوویەكی دێرینی هەیە، لە سەرەتای پەیدابوونی شۆرشی كورد قوربانی داوە، دوای هەرەس و سەرلەنوێ دامەزراندنی شۆرشی نوێی گەلەكەمان (مەبەست ی.ن.ك)ە، زۆر رۆڵەی قارەمان و نەبەردی خستووەتە قوتابخانەی كوردایەتی، لە راپەڕینە مەزنەكەی بەهاری ١٩٩١دا خەڵكی ئەم شارە جوامێرانە رووبەرووی سەرانی رژێم بوونەوە، بەشێوەیەكی سەرسوورهێنەرانە شارەكە دەكەوێتە ژێر ركێفی جەماوەر و هێزی پێشمەرگەی كوردستان، نزیكی جوگرافیای شاری كفری لە بەغدا ئەو زانیارییانە پشتراست دەكاتەوە، بەڵام پێویستە بوترێت فەرماندەكانی پێشمەرگە ئامادە بۆ بەرنامەی پێشوەختی راپەڕینی كفری دەكەن، بەتایبەت پێشمەرگە پارتیزانەكانی (یەكێتی نیشتمانی كوردستان) بەهاوكاری رێكخستنە نهێنییەكانی دێنە ناو شاری كفری، پاشان نەخشەی ئازادكردنی شار دادەرێژن.

هەروەكو فەرماندەی سەربازی عوسمانی حاجی مەحموود بەشداربوو لە رزگاركردنی كفری و خورماتوو لە كتێبەكەیدا نووسیویەتی: شەوی ٨-١٩٩١/٣/٩ شەهید حەمەرەش چووە ناو شاری كفری، بە مەبەستی بینین و رێككەوتن لەگەڵ رێكخستنەكان بۆ جێبەجێكردنی بەرنامەی راپەڕینی كفری، شەوی دواتر ٩-١٩٩١/٣/١٠ عوسمانی حاجی مەحموود بە لێپسراویەتی هێزێكی پێشمەرگەی (٢٥)كەس دێنە ناو شاری كفری، لەگەڵ شانە چەكدارەكان لە قەسابخانەی خوار كفری یەكتر دەگرنەوە، پاشان دەچنە ماڵی (سەلام محەمەد رەحیم)، تا سەعات چوار دەمێننەوە، بۆ رزگاركردنی شار و هێرشكردنە سەر دام و دەزگاكان، بڕیار دەدەن سەرەتا مونەزەمە و دائیرەی ئەمن دەست پێ بكەن، شەهید حەمەرەش و عەلی سوور و بەشێك لە پێشمەرگەكان بۆ دائیرەی ئەمن دیاری دەكرێن، عوسمانی حاجی مەحموود و ئەوانی دیكە بۆ مونەزەمە دادەنرێن، سەعات (٤:٢٠) خوولەك دوای پەلامار و بەرگرییەكی كەم كفری ئازاد دەكرێت، لە ماوەیەكی كەم دا جەماوەر و پێشمەرگە تێكەڵاوی یەكتر دەبن ئەمەش بە رووداوێكی گرنگی مێژوویی دادەنرێت، بۆ یەكەمجار لە ماوەی حوكمی شۆڤێنی بەعس، دانیشتووانی كفری ئازادی بەدەستبهێنن.

لەبارەی پلانی سەربازی ئازادكردنی كفری دەوترێت، پێشمەرگە پارتیزانەكان لە قوڵی گەرەكی (ئازادی) دەچنە ناو شاری كفری، سەرەتا بۆ ماڵی سەلامە سوور دەچن، ئەو پێشمەرگانە بریتی بوون لە (عوسمانی حاجی مەحموود)، شەهید حەمەرەش، شەهید ئەحمەدی حاجی رەشید، شەهید مام سابیر، عەلی سوور، جەلال، شكور قەرەبڵاخی، عەلی هۆمەر، مەلا سەعید خەباتە سوور، مەحموود...هتد)، بەرنامەی ئازادكردنی شار دادەنرێت، وەكو لەسەرەوە باسكرا لە ماوەی نیو كاتژمێر شار ئازاد دەكرێت، بێ ئەوەی هیچ پێشمەرگەیەك شەهید بێت، شایانی باسە رزگاركرنی شاری كفری، پانتایی جوگرافیای راپەڕین فراوانتر دەكات، بە گشتی فشاری زیاتر لەسەر رژێمی بەعس دروست دەكات، ئەو فشارانە رژێم دواتر دەردەكەوێت، بەتایبەتی لە ماوەی هێرشە قورس و بەردەوامەكانی بۆ سەر شاری خورماتوو.

رژێمی بەعس دوای ئازاكردنی شارەكە دەكەوێتە هێرش و بۆردومانكردنی، لە رۆژی (١٣ی شوبات تا ٥ی نیسان رژێم بە پاڵپشتی هێزەكانی موجاهیدینی خەڵقی ئێران، دەست بە هێرشی چڕ و فراوان دەكات، بە هەموو جۆرە چەكێكی قورس و سووك و دەبابە و راجیمە و تۆپ و دۆشكە بەردەوام دەبێت، تا شەوی كشانەوە لە كفری لە ٥-٦نیسانی ساڵی ١٩٩١ هێزی پێشمەرگەو جەماوەر لەبەرگریدا دەبن، بەبێ ئەوەی بتوانن یەك بست لە خاكی كفری، داگیربكەن، نزیكەی یەك مانگ دەخایەنێت، دوا بەدوای ئەوە كفری وەكو شارەكانی دیكەی هەرێم داگیردەكرێتەوە، بەڵام پاش كشانەوەی رژێم لە زۆربەی شارەكان هەرێمی كوردستان، واتا ساڵی ١٩٩١ەوە تا ئێستا شارەكە لەلایەن كوردەوە بەرێوەدەبرێت.

لە راپەڕیندا دواتر ئازاكردنی شار و دووبارە هەوڵی رژێمی بەعس، شانبەشانی هێزەكانی رێكخراوی موجاهیدینی خەڵقی ئێران، ژمارەیەك پێشمەرگە و جەماوەر شەهیدبوون بەتایبەت لەبەرواری ١٣ی ئاداری ساڵی ١٩٩١ ئەوەی تا ئێستا دەربارەی ژمارەی شەهیدەكان زانراوە ئەمانەن (سەروەت ئەحمەد رەحیم حەسەن، سابیر نەجم سابیر، هەڵكەوت ئەحمەد غێدان خەڵكی باوە مەحموود، حوسێن رەحیم حەسەن، نەجیب حوسێن حەسەن، هەڵكەوت جەبار حوسێن، ئەمە جگە لە عەلی حەسەن لوتفی لە بەرواری ١٤ی ئادار شەهیدبووە.

*** ئاراستەی جووڵەی سەربازی موجاهیدینی خەڵق لە راپەڕیندا:-**

جوگرافیای بنكە و بارەگا سەربازییەكانی موجاهیدینی خەڵق لە سنووری (جەلەولا، كفری، نەوجول، خورماتوو، عوزێم)، هەر لە سەرەتاوە كاریگەریی و مەترسی لەسەر راپەڕین دروست كرد، لەبەر ئەوەی پشتیوان و هاوكاری سەربازی رژێمی بەعس بوون، رژێمی بەعسی نیشاندا هاوهەڵوێستی دوژمنكارانەیان دەركەوت.

هێزەكانی (موجاهیدینی خەڵق)، هەر لەو ساتە وەختەوە لە (جەلەولا، كوڵەجۆ)وە دزەیان كرد، بەدرێژایی رێگەكەیان چەندان خەڵكی سڤیل و پێشمەرگەیان شەهیدكرد، تەنانەت مەحموود سەنگاوی لە بیرەوەرییەكانی دا دەڵێت:- لە شەری كوڵەجۆدا رۆژی (١٩٩١/٣/١٨) هێزەكانی موجاهیدینی خەڵق ویستیان دزەمان بۆ بكەن و پشتمان لێبگرن، بەڵام ئێمە ئاگامان لە نەخشەكەیان بوو، هێرشمان بۆ كردن و ناقیلەیەكی تایە زنجیر كە دۆشكایەكی ٢٣ملمی لەسەربوو گیرا، بورها نقای لە گرتنەكەیدا دەوری باڵای هەبوو، رۆژی دواتر ئۆتۆمبێلێكی موجاهیدین رێگەی هەڵەكرد و هاتە ناومانەوە، كەوتە دەست لەشكری بەدر و هەردوو سەرنشینەكەی كوژران، دووبارە مەحموود سەنگاوی لە

بیرەوەرییەکانی دەنووسێت " رۆژی ١٩٩١/٣/٢٥ هێزێکی زۆری موجاهیدینی خەڵق، لە چەند قۆڵێکی جیاوە بەمەبەستی دوورخستنەوەی مەترسی هێزی پێشمەرگە لەسەر جەلەولا هێرشیان کرد، لە جەلەولاوە بۆ کەلار، لە خانەقینەوە بەرەو مرواری، لە قەرەتەپەوە بەرەو بان ئاسیاو لەوێوە بەرەو کەلار لێرەدا دەبینرێ هێزەکانی موجاهیدینی خەلق پانتاییەکی فراوانی شەڕ دژی هێزی پێشمەرگە و جەماوەر لە ئەستۆ دەگرن، شانبەشانی هێزە داپڵۆسێنەرەکانی بەعس بەرگری لە رژێم دەکەن، لە چەند ناوچەیەکی جیاجیاوە هێرش بۆ سەر پێشمەرگە و جەماوەری راپەریو دێنن.

سەنگاوی ئاماژە بەوەش دەکات موجاهیدینی خەڵق پێشتر لە قۆڵی کفرییەوە پەلاماریاندا بەڵام تێکشکان، شەڕ بەسەختی دەستی پێکرد، هێزەکانمان ئابلوقەدران تاکو دەهات ناوچەکەمان لەسەرمان تەنگەبەرتر دەبووەوە، دوا بەدوای ئەوە کاتژمێر (٥:١٠)ی سەر لەبەیانی توانیمان لە ٥٠٠م سەروو دێی ئیسلاحەوە خۆمان بگەیەنینە ناو باخەکانی شێخ یاوەرەوە، هەندێك لە هێزەکانی دوژمن دوور بەکەوینەوە، لەوێ کۆبوونەوەیەکم بە هێزەکە کرد، ئێمە بۆ شەڕی بەرگری هاتووین، مەرج نییە هەموو کاتێك سەرکەوتن بێت، هەندێ جاریش تووشی گیروگرفت دەبین و تەنگمان پێ هەڵدەچنن و دەکەوینە تەنگانەوە، دەبێ خۆراگربین و ورە بەرزبین، ئەمەش شەڕێکی دیکەی موجاهیدینی خەڵقە، بەتایبەت لەگەڵ هێزەکانی (ی.ن.ك).

### * ئازاکردنی دووزخورماتوو بەرگرییەکی خوێناوی

قەزای خورماتوو دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی شاری کەرکووك بەدووری ٨٨کم لەسەر رێگای گشتی بەغدا - سلێمانی، رووبەری ئەم قەزایە بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ بریتییە لە ٦٩٩١کم² گەورەترین قەزای پارێزگای کەرکووکە، رژێمی بەعس پرۆسەی دابڕینی خورماتوو لە کوردستان جێبەجێ دەکات، لەبەر ئەوە بە ئامانجی بچووکردنەوەی پارێزگای کەرکوك، قەزای خورماتوو دادەبڕێت و دەیخاتە سەر سەلاحەدین.

راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ خورماتووی گرتەوە، بە پلانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و هاوکاری و پشتیوانی جەماوەر و شانە چەکدارەکان، شاری خورماتوو ئازاد دەکرێت، ئەویش دوای ئازادکردنی شاری کفری، شەوی ١٠-١١ی ئاداری ساڵی١٩٩١ بەسەرپەرشتی عوسمانی حاجی مەحموود شەهید حەمەرەش، دەستەیەك پێشمەرگە ئاگادارەکەنەوە بە ئامانجی رزگارکردنی خورماتوو، ئەوانە بریتی بوون لە ٧پێشمەرگەی پارتیزان ئەوانیش شەهید حەمە ئاخە، شەهید مەجید دووزی، شەهید نادر مەجید، مولازم عەباس، سەلام کۆیی و سەباح شێخە حەمیدی) لەگەڵ چەند کەسێکی تردا لەگەڵی هەنجیرە بۆ دەنگوباسی شار یەك دەگرن، پاشان سەعات (١)ی پاشنیوەرۆ دادەبەزنە ناو شار، بەهاوکاری جەماوەر و رێکخستن و شانە چەکدارەکان، سەعات٦ی ئێوارە شار ئازاد دەکەن، پاش ٦رۆژ لە ئازادبوونی شاری خورماتوو، دواتر یەکەم شەڕی پێشمەرگە لەگەڵ (موجاهیدینی خەڵق) هەڵدەگیرسێت، دوای ئەوەی شاری خورماتوو لەپاش نیوەرۆی (١٩٩١/٣/١٠) ئازاد دەکرێت، لەلایەن پێشمەرگە پارتیزانەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بەهاوکاری شانەی چەکدار و جەماوەری راپەریوو، هاوکات هێزی موجاهیدینی خەڵقی ئێران لەگەڵ هێزەکانی رژێمدا بۆ سەرکوتکردنی راپەرین دێن، ژنانیش بەجۆش و خرۆشەوە بەشداری دەکەن، یەکێك لەو ژنانە بە حەماسەوە پێشوازی راپەرین دەکات، خوشکە مەهاباد بە شیعر پێشوازی لە پێشمەرگە و جەماوە دەکات، تەنها ئەو سەرچاوەیە رۆڵی ژنان لە راپەرینی خورماتوو نیشان دەدات، ئەمە لە کاتێکدا لە زۆربەی شار و شارۆچکەکانی کوردستان، تا ئێستا باسی رۆڵی ژنان نەکراوە.

بەڵگە نەویستە هەڵکەوتەی ستراتیجی خورماتوو بۆ رژێم بایەخی تایبەتی هەیە، چونکە کەوتووەتە سەر رێگای کەرکوك - تکریت - بەغدا، دەبینین کاتێك شاری خورماتوو ئازاد دەکرێت پەیوەندی هاتوچۆی نێوان کەرکووك و بەغدا لەو رێگایەوە نەماوە، مەترسییەکی گەورەی لەسەر دوژمن دروست کرد، چونکە لە دووزەوە دەتوانرا بۆ حەمرین و تکریت برۆن، لە ئەنجامی هێرش و بۆردومانی چڕی موجاهیدینی خەڵق و رژێمی بەعس ژمارەیەکی زۆر لە پێشمەرگە و خەڵکی راپەریو شەهید دەبێت، بەجۆرێ شەهیدانی خورماتوو لە راپەریندا زۆر لە شەهیدانی شارەکانی کوردستان زیاترن.

### * موجاهیدینی خەڵقی ئێران کۆسپێکی گەورەی راپەرین:

هەر لەسەرەتاوە هێزی موجاهیدینی خەڵق دەبنە کۆسپێکی گەورەی راپەڕین، لە چەند شارو شارۆچکەیەکی کوردستان بەتایبەت لە رزگارکردنی شاری خورماتوو، بەپێی قسەی فەرماندەی سەربازی هێزی پێشمەرگە عوسمانی حاجی مەحموود، ناوبراو بەشدار و شایەتحاڵی رزگارکردنی خورماتوو شەڕی موجاهیدینە، بەم شێوەیە باسی ئەو رۆژە دەکات، ((کاتێك رۆژی ١٠ی ئاداری ساڵی ١٩٩١ نزیکەی ٣٥ پێشمەرگە بە بناری زنجیرە گەچەکەی نێوان کفری و خورماتوودا بەرەو خورماتوو دەڕۆن، تووشی هێزێکی موجاهیدینی خەڵقی ئێران دەبن، بەڵام شەڕ دروست نابێت، ١٠ی ئاداری پێش دەستپێکردنی راپەڕین بە کاتێکی کەم، هێزێکی موجاهیدینی خەڵق بریتی بوون لە ٢٠-٢٥ دەبابە و ئۆتۆمبێل لە نەوجولەوە بۆ سلێمان بەگ تێدەپەڕن، بەشێکی هێزەکە دەڕوات و بەشێکی دیکە لە سەرووی شار لەسەر جاددەی خورماتوو - کەرکوك دەمێننەوە، دەبینین بڵاوبوونەوەی هێزی موجاهیدینی لە ناوچەکە جێگیربوونی لە دەوروی شاری خورماتوو و سلێمان بەگ هێزێکی گەورەی پڕ چەك و تەقەمەنی پێشکەوتوو، زیاتر کێشە و بۆ هێزی پێشمەرگە و جەماوەری راپەری و دروست دەکات)).

بەتایبەتی هەروەکو عوسمانی حاجی مەحموود باسی دەکات، موجاهیدین هەموو بەرنامەیەکیان لێ شێواندین، لای رۆژهەڵاتی شاری خورماتوو موجاهیدینی لێ بوو کە ١٥-٢٠کم لە شارەوە دوورە، دواتریش دەبابەکانی

موجاهیدین لە ١٠ی ئاداری بوون بە دوو بەش، بەشێك لەسەر ڕێگای سلێمان بەگ بەشەکەی تر لەسەر ڕێگای کەرکووك، شەوی ١٠-١١ی ئادار ئەو بەشەی لای سلێمان بەگ گەڕانەوە نزیك شاری خورماتوو، ئینجا دوای ئەوەی سەعات ٦ی سەرلەبەیانی ١١ی ئادار هێزێك بەسەرپەرشتی شەهید حەمە ئاخە و شەهید مەجید دووزی بۆ کەرتی خوار شار دەنێردرێن، تا لەوێ سەنگەر بگرن، لەو کاتەدا لەلایەن هێزەکەی موجاهیدین تەقەیان لێدەکرێ و شەڕ دادەمەزرێت، شەهید حەمەڕەش و عوسمانی حاجی مەحموود بۆلای شەڕەکە دەچن، دوای چەند جار هێرش دوژمن دەشکێت، دوو دەبابەو سەیارەیەکی پیکاب کە دۆشکەی لەسەرە پەك دەخرێت، بەهۆی سەیارەکەوە دەزانرێت موجاهیدینی خەلقن، کەواتە ئەوە یەکەمین شەڕی موجاهیدینی و هێزی پێشمەرگەیە لە خورماتوو.

*** گفتوگۆی موجاهیدین و پێشمەرگە لە خورماتوو:--**

موجاهیدینی خەلق هەوڵ دەدەن لە ڕێگەی گفتوگۆ بگەڕێنەوە بۆ بارەگای سەرەکییان لە عوزێم، بۆ ئەو مەبەستە لەلایەن عوسمانی حاجی مەحموود پێشمەرگەیەك بۆلای هێزەکانی موجاهیدین دەنرێدرێت، بەناوی موشیر عەلی شەریف، ناوبراو دەڵێ: لەسەر داوای عوسمانی حاجی مەحموود چەند جارێك چووم بۆلای هێزەکانی موجاهیدین، تا بە ئاشتی بەناو شاری خورماتوودا تێپەڕن، تا دواجار داوای بینینی عوسمانی حاجی مەحموودیان کرد، لەگەڵیدا چووم و گفتوگۆیان لەبارەی ڕۆیشتنی ئەوان کرد، بەڵام بەردەوامی شەڕ لە بەشەکانی تری خورماتوو، بۆردومان و هێرشی سەختی ڕژێم، جۆش و خرۆشی جەماوەر چەند جار ئاستەنگ بۆ ڕۆیشتنی هێزەکانی موجاهیدین دروست دەکات.

جارێکی تر عوسمانی حاجی مەحموودو مەلا سەعدی دەچنەوە لایان بۆ گفتوگۆ موجاهیدین دەڵێن: تا سێ سەعاتی تر شارمان بۆ چۆڵ بکەن و بڕۆن، چونکە دڵنیاین لێتان و شەڕمان دەکەن، ئەوانیش دەڵێن: ئەگەر چۆڵی نەکەین؟، لە وەڵامدا دەڵێن: هێرشتان بۆ دەکەین و شارتان بەسەردا دەڕووخێنین بە دەبابە، ئەمجارەش گفتوگۆ ئەنجامی نابێت، بۆ جاری سێیەم لە ڕێگەی ناردنی شۆفێرێ هەوڵی بینینی هێزی پێشمەرگە دەدەن، هاووڵاتییەك دەنێرن بڕیار دەدەن سەعات چواری پاش نیوەڕۆ بەشاردا تێپەڕن، ئاگاداری جەماوەر و پێشمەرگە دەکرێت، هیچ کەسێك تەقە لە موجاهیدین نەکات، لەو کاتەدا دوژمن هێرش دەکات، بەڵام هێزەکەی موجاهیدین هیچ جۆرە جموجۆڵێ ناکات، ئەمجارەش هەر لە شوێنی خۆیاندا دەمێننەوە.

جارێکی دیکە سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٢ی ئادار موجاهیدین کە لەسەر جاددەی کەرکوك دەبن، هەواڵ دەنێرن بەیانی سەعات یانزە تێدەپەڕن، سەعات یانزە عوسمانی حاجی مەحموود دەچێتە لایان، ڕێکدەکەون بەسەیارە پێش موجاهیدین دەکەون و دەڕۆن و لە شار دەردەچن، بەڵام دوای تێپەڕبوون هێزەکەی موجاهیدین بە ئەوانەی لە نەوجولیشەوە بۆ سلێمان بەگ ڕۆیشتوون، لەگەڵ هێزو بنکەکانی (عوزێم) خەتێکی بەرگری دروست دەکەن، لەنێوان تکریت و خورماتوو لە دێی (یەنگیجە)وە تا کفری و جەلەولا و خانەقین، بەشێکیشیان لەگەڵ هێزەکانی دوژمن یەك دەگرنەوە، لە هێرشەکاندا بۆ سەر خورماتوو بەشداری دەکەن.

داستانی ٩ ڕۆژەی بەرگری لە شاری خورماتوو ٢٥٠کەس لە پێشمەرگە و جەماوەری ڕاپەڕی و تۆمار دەکرێت، بە جۆرێ ٢٠ پێشمەرگەی دێرین و بەرپرس شەهید دەبن، هەموویان پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوون، تەنها لە ڕۆژی ١٧ی ئادار مەفرەزەیەکی حیزبی سۆشیالیست بەشداری دەکەن، پاش بەرگرییەکی خوێناوی نەهاتنی هێزی پشتیوانی بۆ خورماتوو، بەرواری ١٩ی ئادار هێزی پێشمەرگە دەکشێتەوە.

*** بەشێك لە شەهیدنی خورماتوو:-**

لە ڕزگارکردنی شاری خورماتوو پاشان بەرگری ٩ ڕۆژەی هێرشی بەردەوامی ڕژێم، ژمارەیەك پێشمەرگەی کۆن و فەرماندە و هاووڵاتی شەهید دەبن، هەندێ لەو شەهیدانە بریتین لە (شەهیدی فەرماندە حەمەڕەشە، شەهیدان: سوڵتان حەمید، سالح محەمەد حوسێن، نادر مەجید جوامێر، ئەحمەد زەرداوی، شکور قەڵایی، ئازاد ڕەشید، ڕەمزی حوسێن، کەمال سابیر قازی، کەریم خەلیل، حەمە ئاخە، مەجید، سەفەر محەمەد حوسێن، عەبدولکەریم قاسم ڕەشید، حەیدەر عەلی عەزیز، تاریق خالید جەبار، عەلی محەمەد سەعید، سەعید محەمەد سەعید، ئەگەر چی ژمارەی شەهید و بریندارانی ڕزگارکردن و بەرگری خورماتوو زیاترە، بە گوێرەی قسەی شایەتحاڵەکان سەرووی ٣٠٠ شەهیدە.

*** شەڕی مەفرەقی سلێمان بەگ لەگەڵ موجاهیدینی خەلق:-**

سەرلەبەیانی ١١ی ئاداری هێزێکی موجاهیدینی خەلق لە (عەوزێم)ەوە دێنە مەفرەقی ڕێگای سلێمان بەگ - کفری و دەمێننەوە، کاتێ هێزێکی جەماوەر و پێشمەرگە لە کفری و خورماتوو دێن، دەکەونە کەمینی دەبابەکانی موجاهیدینی خەلق، زیاتر لە ٤٠ کەس شەهید دەبێت، دیارە دوای ئازادکردنی شاری کفری ڕۆژی ١١ی ئاداری ساڵی١٩٩١ چەند هێزێکی جیاجیا، بەرەو شاری خورماتوو بەهانای شاری خورماتوو دەچن، لە مەفرەقی سلێمان بەگ دەکەونە ناو هێزێکی موجاهیدینی خەلق، بەشێکی بە سەیارەیەکی کۆستەر نزیکەی ٢٢ پێشمەرگە دەبێت، بەسەرپەرشتی شوکر دوانزە ئیمامی و سەلاحەدینی محەمەد، کاتژمێر دوای ٨:٣٠ لەلایەن موجاهیدینی خەلق هێرشیان بۆ دەکرێت، بە زیاتر لە ٥٠ دەبابە و هێزی پیادە، پاش بەرگرییەکی کاتژمێری بەشی زۆری شەهید دەکرێن، بەشێکی دیکەش لەلایەن هێزەکانی موجاهیدینی خەلق دیل دەکرێن، پاش ماوەیەك زیندانی کردن، دواتر لەلایەن موجاهیدینی خەلق ئازاد دەکرێن.

هێزێکی دیکە لەلایەن سەلام شووشە و ئازادە سوور بەشداری شەڕی سلێمان بەگ دەکەن، زیاتر لە (٤٦) کەس شەهید دەبێت، تەنانەت "شەهید شوکر و حاجی مەحموودو

منداڵێك" کە لە کاتی شەڕەکەدا لە تەکسی دادەبەزن، لەلایەن موجاهیدین خەڵق بەدەبابە پان دەکرێنەوە، ئەمەش کۆمەڵکوژییەکی گەورەی کوردە لەلایەن موجاهیدینی خەڵق دژی جەماوەری ڕاپەڕیوو ئەنجام دراوە.
بەپێی گێڕانەوەی بەشداربوویەکی دیکەی شەڕی مەفرەقی سلێمان بەگ، بەهۆی نابەرابەری هێزی موجاهیدین و پێشمەرگە و جەماوەر، دوانزە دیل دەکرێن، ئەوانیش (ئیبراهیم حەمە نایلۆن، عەبدوڵڵا حەمە نایلۆن، محەمەد جەبار، لوقمان ئەسعەد فارس، شەلال حەسەن فەتحوڵڵا، ئیدریس قادر شاکر، سالار حەمەخان، داود سەرکەلی، لەو ٣٥ کەسە تەنها ١٣کەس ڕزگاری دەبێت، ئەوانی دیکە هەموو شەهیدو دیل دەکرێن، بۆ ماوەیەکی زۆر لە زیندانەکانی موجاهیدینی زیندانی دەکرێن، پێدەچێت تا ئێستا ژمارەی دروست، لەبارەی (شەهید، بریندار، دیل)ەکان ئاماژەی پێ نەدرابێت، بەڵام بەشێکی ئەوانە بەشێوەی جیاجیا باس کراون.

*** شەهیدانی مەفرەقی سلێمان بەگ (١٩٩١/٣/١١):**
لە شەڕی مەفرەقی سلێمان بەگ، موجاهیدینی خەڵق کۆمەڵکوژییەکی گەورە ئەنجام دەدەن، ژمارەیەك پێشمەرگە و هاووڵاتی زۆر دڕندانە شەهید دەکەن، تا ئێستا ئەوەی زانراوە، شەهیدانی مەفرەقی سلێمان بەگ ئەمانەن:-
محەمەد ئەحمەد محەمەد عەلی، عەزیز ئەحمەد محەمەد عەلی، سەلاحەدین ئەحمەد محەمەد، عەلی عەبدوڵڵا جوڵا، بەکر سدیق حوسێن، سەمەد ڕەحیم حەسەن خەلیل، عومەر بێکەس، عەلی مەحموود، بورهان عەلی ڕۆستەم ناسراو بە (بورهان عەلە خەجە)، شکور ڕەشید نەجم قەوالی، شەلال ڕەشید نەجیم قەوالی، حاجی مەحموود (برای کاك عوسمان)، محەمەد شکور، ئەحمەد محەمەد ناسراو بە (ئەحەی حەمەی ئولفەت)، سالار حەمید ڕەوف، ئومێد عومەر ساڵح، دارا ڕەشید عەبدولقادر، حەکیم عەزیز ساڵح، محەمەد عوسمان حەمە غەریب، عومەر محەمەد ئەمین، لوقمان عەبدولڕەحمان، فەرهاد ڕەحمان ڕەحیم، تەحسین سەعید عەبدوڵڵا، تەلعەت شەوکەت مەجید، محەمەد نامیق تەیب، ڕێبوار ئەحمەد محەمەد، مەجید عەزیز عەبدوڵڵا، عومەر ئەحمەد سلێمان، شەریف فایەق محێدین، عەزیز ئەبو شوارب، ئەحمەد محەمەد قادر، زانیاری لەبارەی شەهیدانی سلێمان بەگ بە زیاتر لە ٤٠شەهید ئاماژەیان پێدراوە، ئاماری شەهیدەکان لە سێ لایەنەوە کۆکراوەتەوە، یەکەمیان: مەیدانی بەشێوەی مەیدانی لە شایەتحاڵ و کەسوکاریان، دووەمیان: بەشێوەی تیۆری لە کتێب و سەرچاوەکاندا.

*** ڕۆڵی خراپی موجاهیدینی خەڵق لە ڕزگارکردنی کەرکووك ساڵی١٩٩١:-**
پارێزگای کەرکوك لە خاکێکی پان و بەرین و بە بڕشتی نێوان دیالە و زێی بچووکە، بەشی باکووری ڕۆژهەڵاتی عێراقە، لەنێوان لیواکانی هەولێر و سلێمانی، بەغدا و دیالە و موسڵ، لە باکوورەوە هاوسنووری هەولێر و بەشێکی سلێمانییە، لە ڕۆژهەڵاتەوە سلێمانی و بەشێك لە دیالە، لە باشوورییەوە دیالە و ڕۆژئاوای بەغداو بەشێك لە موسڵ، لە ڕووی جیۆپۆلەتیك بایەخی زۆری هەیە، هاوسنووری پێنج پارێزگای عێراقە، کورد لە کۆنەوە لەسەر دۆزی کەرکوك لە کێشمەکێش دایە، زیاتر لە (٣٥) ساڵ حوکمرانی بەعس، سیاسەتی (ڕاگواستن، بەعەرەب کردن، و هتد)ی تێدا پیادە کردووە، لە ڕاپەڕینی (١٩٩١/٣/٢١) بۆ یەکەمجار بۆ ماوەیەکی کەم شاری کەرکووك ئازادکرا.
بەڵام ڕۆڵی تێکدەرانە و خراپی موجاهیدینی خەڵقی ئێرانی لەو کاتەدا، هاوکاریکردنیان لەگەڵ هێزە شکست خواردووەکانی ڕژێمدا، نەخشەی تەواوی ئابلوقەی شاری کەرکوکی لە باشوورەوە تێکدا، زەمینەی خۆشکرد بۆ ئەوەی ڕژێم هێزی تازە نەفەسی خۆی، بۆ دووبارە دەست بەسەرگرتنی کەرکوکدا ڕەوانەی ناوچەکە بکات، هەر ئەوەیش یەکێك بوو لە هۆکارە گرنگەکانی هاتنەوەی ڕژێمی بەعس بۆ کەرکوك، چونکە حکومەتی عێراق پاش کۆکردنەوەی هێزێکی زۆری سەربازی و یارمەتی (موجاهیدینی خەڵقی ئێران) هێرشی کردە سەر دەڤەرەکانی (سلێمان بەگ، پارەپارە، قەلات)، لە ئەنجامی ئەم هێرشەی کە لە دیالەوە هاتبوون، شەڕێکی قورس لەنێوان هێزی پێشمەرگە و سەربازەکانی عێراق لە گەرمیان ڕوویدا، ئەمەش کاری کردە سەر ئەوەی نەتوانرێ لە قۆڵی سێیەمەوە هێرش بۆ ئازادکردنی کەرکوك بکرێت، بەڵام لە دوو قۆڵەکەی ترەوە ئەنجام درا، دەبینین لێرەدا پشتیوانی و هاوکاری موجاهیدینی خەڵق، دەبێتە کۆسپی بەردەم جێبەجێکردنی نەخشەی ڕاپەڕین، لە سنووری گەرمیان بەرەو کەرکوك، کاریگەری نەرێنی خراپ دروست دەکات، لەسەر پلانی ڕزگارکردنی شاری کەرکوك، ئەم هەڵوێستەی موجاهیدین فاکتەری سەرەکی دووبارە داگیرکردنەوەی کەرکوك دەژمێردرێت.

*** هێرش و پەلاماری موجاهیدین بۆ داگیرکردنەوەی کەرکوك:**
هەروەکو دکتۆر نوری تاڵەبانی زیاتر باس لە ڕۆڵی موجاهیدین لە سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی کەرکوك دەکات، کە چۆن چۆنی لەلایەن ڕژێم و موجاهیدین جارێکی دیکە شارەکە داگیر دەکرێتەوە، نوری تاڵەبانی لەو باوەڕەدایە کەرکوك بایەخی بۆ ڕژێم هەیە،لەمپەڕێکی ئەمینە بۆ ناوچەکانی بەغدا ڕژێم پەرەی زۆری بە ئامادەیی سەربازیی خۆیدا، لەگەڵ گرووپی موجاهیدینی خەڵقی ئێران هەماهەنگی کرد، ئەم گرووپە وەك جاش هەڵسوکەوتی کرد، زۆر دڕندانە بەرگری لە ڕژێم کرد، چەند مەفرەزەیەکی ئەم گرووپە چەکدارە بە جلی پێشمەرگەوە دزەیان کردە ناو شاری کەرکوك، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ یەك لە دوای یەك لە ٢٧ی ئاداری ساڵی ١٩٩١ەوە شارەکە بە چەندین جۆر بە چەکی قورس بەسەختی بۆردومان کرا، لە ئاکامدا دانیشتوانی کەرکوك ناچار بوون، بەجێی بهێڵن، تاوانێکی دیکەی ڕژێمی بەعس شەهیدکردنی دۆستێکی میللەتی کوردە، دەوترێت ڕۆژی (١٩٩١/٣/٢٩) لە کاتی پەلاماری هێزەکانی سوپای عێراق و موجاهیدینی خەڵقی ئێران بۆ تێکشکاندنی دەستکەوتەکانی ڕاپەڕین و گرتنەوەی

شاری کەرکوك، لە خۆرهەڵاتی شاری کەرکوك هێزەکانی ڕژێمی بەعس ڕۆژنامەنووسی ئەڵمانی "گادگروس" شەهید دەکەن، ناوبراو ڕۆژنامەنووس و فۆتۆگرافەری ئەڵمانی بۆخۆی لە یادداشتەکانیدا نووسیویەتی بە کامێراکەم بەشداری خۆشی و زەماوەندی سەرکەوتنی کوردەکانم کرد، گادگروس لە ساڵی ١٩٦٤ لە ڕۆمانیا لەدایکبووە و دایکی ئەڵمانییە و تاقانەیە، لەلایەن ڕژێمەوە گوللەباران کراوە، هەرچەندە دایکی هەوڵیداوە سۆراغی بکات، بەڵام تا ئێستا ڕوفاتی پیرۆزی بزرە شەهیدبوونی زیانێکی دیکەی بە ناساندنی دۆزی کورد گەیاندووە، چونکە لەکاتی خۆیدا دەیتوانی لە ڕێگای کاری ڕۆژنامەوانی و وێنەگرتن، زیاتر کۆڕەو و شکستی ڕاپەڕین نیشانی جیهانی دەرەوە بدات.

هەرهەمان ڕۆژ دوای داگیرکردنەوەی کەرکوك لەلایەن سوپای عێراق و هێزەکانی موجاهیدینی خەلق، تیپێك پێشمەرگە دەڤەری سلێمانی هەفتەی پێشووتر بەشداری ڕاپەڕین و ڕزگارکردنی کەرکوکیان کرد، لەکاتی کشانەوە لە هەردەکانی گوندی چیمەن، ڕۆژهەڵاتی کەرکوك، بەر بەهێزی ڕژێمی بەعس دەگرن، (٥٣)پێشمەرگەی (ی.ن.ك) بە بۆردومانی پۆلە هەلیکۆپتەرێك شەهید دەبن، هەر لە چیمەن بە خاك سپێردراون، جارێکی دیکە شاری کەرکوك کەوتەوە دەست ڕژێمی بەعس، زیانێکی زۆری گیانی ماددی و بە خەڵکی کەرکوك گەیاند، تا ساڵی ٢٠٠٣ لەژێر فەرمانڕەوایی بەعس مایەوە، دواتر لە پرۆسەی ئازادی عێراق ئازادکرا، ئێستا بەشی زۆری دام و دەزگاکانی کەرکوك، لەلایەن کورد بەڕێوەدەبرێن.

* سەرچاوەکان:-

١- ئەحمەد باوەر، دیوانی شەهید محەمەد پەژار، ١٩٥٤-١٩٩١، چاپی دووەم چاپخانەی کارۆ، ٢٠١٤.
٢- بەهمەن سەعیدی، ٥ساڵ لەگەڵ عەبدوڵڵای موهتەدی (سکرتێری کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران)، ٢٠١٠,
٣- بەهمەن سەعیدی، سێ ساڵ لەگەڵ ئیبراهیم عەلیزادە سکرتێری کۆمەڵە (دیدارێکی تایبەت بە مێژووی سی ساڵەی کۆمەڵەی کوردستانی ئێران و بزووتنەوەی چەپ)، بەرگی دووەم، چاپی سێیەم، ئینتیشاراتی ناوەندی کۆمەڵە، کوردستان، ٢٠١٢.
٤- پشکۆ حەمە تاهیر عەبدولرەحمان ئاغجەلەری، چاپی یەکەم، کتێبی ڕووناکبیری ژمارە٤٣، سلێمانی ٢٠٠٤.
٥- جەلیل گادانی، پەنجا ساڵ خەبات (کورتە مێژوویەکی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، زنجیرە ٢٧٠، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٨.
٦- جەمال شێخ نووری، وێرانکاری و تاوانەکانی بەعس لە بیرەوەرییەکاندا، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٧- جێرمیا گۆلکا، لیدیا هەنسڵ، ئیلیزابێس وێلك، جودیس لارسن، موجاهیدینی خەلق لە عێراق گرێکوێرەی سیاسەت، وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە: لەیلا حەمید، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر ٢٠١١.
٨- ڕزگار حاجی حەمید، کەلار (مێژوویەکی دێرین و جوگرافیای شارێکی زیندوو)، ١٩٧٠-٢٠١٢، چاپی یەکەم، چاپخانەی یاد، ٢٠١٥.
٩- سەرکۆ محەمەد ڕۆستەم، پەژاری شیعر گوڵ، چاپی یەکەم، چاپخانە و ئۆفسێتی ئاسا، تشرینی یەکەمی، ٢٠٠١.
١٠- سوارە حەسەن باجەلان، مێژووی کەلار، چاپی یەکەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١١.
١١- مەلا شاخی، ڕاپەڕین و ڕزگاری کەرکوك، چاپی دووەم، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری شەهید ژمارە ٤٢، کەرکوك ٢٠١٢.
١٢- شەریف عەلی (هەژاری)، موجاهیدینی خەلق و هەڵوێستی بەرانبەر بە نەتەوەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان (١٩٦٤-١٩٩٤)، چاپی یەکەم، چاپخانەی سیمان، سلێمانی ٢٠٠٨.
١٣- شەریف وەرزێر، ڕاپەڕین و سەروەریی (باسێك لە ڕاپەڕینی جەماوەریی ئازاری ١٩٩١ و ڕۆڵی بزاڤی ئیسلامیی کوردستان)، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، لە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی کۆمەڵ، سلێمانی ٢٠١٠.
١٤- عەبدولڕەزاق مەزرنگ، ڕاپەڕین و بەهاری ئازادی، چاپخانەی ڕەنج سلێمانی ٢٠٠٤.
١٥- عوسمانی حاجی مەحموود، کلپەی ڕاپەڕین لە کوانووی شاری دووزدا، ئاداری، ١٩٩٣.
١٦- مامۆستا عوسمان کانی پانکەیی، سەروەرییەکانی

یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ڕۆژگارە سەختەکانی گەلی کورددا، چاپی چوارەم، سلێمانی ٢٠١٣.
١٧- محەمەد شاکەلی، گەرمیان ڕابردووی نزیك و ئاینده (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی جوگرافیی سیاسییە)، پێداچوونەوەی دلێر میرزا، چاپخانەی کارۆ، ٢٠٠٣.
١٨- مەحموود سەنگاوی، بیرەوەرییەکانی سەنگاوی، چاپخانەی تیشك، سلێمانی ٢٠٠٤.
١٩- دکتۆر نوری تاڵەبانی، سیاسەتی گۆڕینی ڕووخساری نەتەوەیی ناوچەی کەرکوك، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران، ژمارەی زنجیرە ١٧، سلێمانی، ٢٠١١.
٢٠- هەورامان کەمال میرزا عەبدوڵڵا و تاریق ڕەئووف محەمەد، ناوچەکانی ململانێ لە نێوان کورد و حکومەتەکانی عێراقدا، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری (ی.ن.ك) زنجیرە ٢٧١، ٢٠٠٨.
٢١- هەیاس کاردۆ، ئەزموونی خەبات (ئاوڕێك لە ژیان و خەباتی عەبدوڵڵا حەسەن زادە)، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١١.
٢٢- یودیت نیورینك، شەهیدانی وێل، وەرگێڕانی: لیژنەیەك لە دەزگای ئاراس، چاپی دووەم لە چاپکراوەکانی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠.
٢٣- دکتۆر عیزەتوڵڵا نوری، تاریخ احزاب سیاسی در ایران، چاپ دوم، انتشارات نوید شیراز، ١٣٨٧. (فارسی).

دووەم: گۆڤار و ڕۆژنامەکان:-
١- ئاری عوسمان خەیات، گۆڤاری هەشتاو هەشت، ژ٣، زستانی ٢٠٠٥.
٢- ڕێبین ڕەسوڵ، گادگروس، گۆڤاری سەرهەڵدان، ژ١٦، ساڵی ١٩٩٦، ل٣٠-٣١.
٣- د. نوری تاڵەبانی، سیاسەتی گۆڕینی ڕوخساری نەتەوەیی ناوچەی کەرکوك، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژ٦٤، شوباتی ٢٠١١.
٤- فاتیح سەلام، کوردستانی نوێ، ژمارە ٢٣٩٩، دوو شەممە، (٢٠٠١/٣/١٢).
* دیدار و چاوپێکەوتن:-
١- ڕێبوار بەکر حەمید (شایەتحاڵ)، سلێمانی سێشەممە (٢٠١٦/٥/٣١).
٢- سەمەد فەرەج لوتفی ئۆمەر بلی (ئامۆزای شەهید)، ناحیەی سەرقەڵا، گوندی ئۆمەربل، (٢٠١٦/٦/١).
٣- محەمەد ئەمین میرزا غەفوور، کەلار (باوکی شەهید شایەتحاڵ)، (٢٠١٦/٦/١).
٤- موشیر عەلی شەریف (بەشداربووی شەڕەکە- دیلی دەستی موجاهیدینی خەڵقی ئێران) سلێمانی مۆزەخانەی سلێمانی (٢٠١٦/٦/٢).
٥- کامەران محەمەد جەوهەر (کامەرانی شەهیدان - دووز) بەرواری ٢٠١٦/٦/١٦.
٦- سالار حەمەخان محەمەد عەلی، شاری کفری، ناوچەی پیشەسازی، ٢٠١٦/٦/١.
٧- داود سەرکەلی، (بەشداربوو - دیلی دەستی موجاهیدینی خەڵقی ئێران) کەلاری کۆن، ٢٠١٦/٦/١.
٨- محەمەد حەسەن عەلی، ناسراو بە (حەمە سوور)، بەشداربوو - دیلی دەستی موجاهیدینی خەڵقی ئێران) سلێمانی ٢٠١٦/٥/٣١.
٩- محەمەد سدیق جۆڵا (کەسوکاری شەهیدەکان، کفری گەرەکی ئیمام محەمەد ٢٠١٦/٦/١.
١٠- مەلیحە ئەحمەد محەمەد عەلی (کەسوکاری شەهیدەکان) کفری، گەرەکی ئیمام محەمەد ٢٠١٦/٦/١.
١١- ڕێبوار بەکر حەمید (شایەتحاڵ)، سلێمانی ٢٠١٦/٥/٣١.

* ئاڵای کوردستان و هەڵکردنی ئاڵا لە کەرکوکدا:-

هەر لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراق باس و خواسی هەڵکردنی ئاڵا و دروستکردنی ئاڵایەکی تایبەت بە کەرکوك لەلایەن ئەمریکییەکانەوە دەخرایە ڕوو و سیناریۆی جۆراوجۆریان دەخستە ڕوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك.
ئەمریکییەکان لە کەرکوك لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە کەرکوك لە سیناریۆی چارەسەری عێراق و کوردستان دوور بکەنەوە، لەو ئاستەدا کاریان دەکرد کە بیکەنە هەرێمێکی سەربەخۆ، کە تا هەموو پێکهاتە و نەتەوەکانی کەرکوك بەوە ڕازی بکەن کە لە چوارچێوەی ئەو هەرێمەی کەرکوکدا ژیان بەرنە سەر.
هەر لەو ڕوانگەیەوە هەوڵی ئەوەیان دا و شێوەکارانی هەموو پێکهاتەکانی کەرکووکیان کۆکردەوە، کە کلێشەی ئاڵایەکی تایبەت بە کەرکووك دروست بکەن کە ڕەنگدانەوەی هەموو پێکهاتەکانی تێدا بێت، بەڵام بەشێکی زۆری کوردەکان ئامادەی ئەم پرۆژەیە نەبوون.
بۆیە لەو ماوەیەی سەرەتای ڕزگارکردنی پرۆسەی عێراق لە ٢٠٠٣ تا سەرەتای ٢٠٠٥ بە هەموو جۆرێك ئەمریکییەکان هەوڵیان دەدا ئەم مەسەلەیەی ئاڵایە بقۆزنەوە و وەکو دەسکەلایەك بەکاریان دەهێنا، بۆ بەکارهێنانی ئاژاوە لەنێوان پێکهاتەکان، هەر لەو دەروازەیەوە ئاڵای کوردستان لە گەرەکە تورکمانییەکان بەرز دەکرایەوە لە گەرەکە کوردییەکانیش ئاڵای تورکمانی بڵاودەکرایەوە، کە تا ڕادەیەکی چاك ئەم سیناریۆیە درێژی کێشاو خەڵکێکی زۆری کەرکووك لەڕووی هەستی نەتەوایەتییەوە سەر گەرمی ئەم یارییە بوون.
بەڵام لە دوای ڕۆیشتنی ئەمریکییەکان لە عێراق و کشانەوەیان لە کەرکوك، هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لەسەر قوتابخانەکانی خوێندنی کوردی بوو بە شتێکی ئاسایی و ئاڵای بەرەی تورکمانی لەسەر قوتابخانە تورکمانییەکان بە هەمان شێوە پەیڕەو دەکرا و حکومەتی عێراقیش چاوپۆشی لێدەکرد.
هەروەها لە دەزگا حکومییەکان تەنها ئاڵای عێراق دەشەکایەوە، لە دەزگا حیزبییەکانیش ئاڵای حیزب و کوردستان و عێراق دەشەکایەوە.
لەدوای هاتنی داعش هەڵکردنی بەشێوەیەکی بەرفراوان لە هەموو شوێن و دەزگاکانی نێو شارەکە هەڵدەکراو لەماڵ و کوچە و کۆڵانەکانیش بوو بە شتێکی ئاسایی و بووە ڕەمزی بەرگریکردن لە کەرکووك لە شەڕی پێشمەرگە بەرامبەر داعش و لەژێر ئەو ئاڵایەدا بە هەزاران شەهید بەرخودان و گیانی خۆیان بەخشی، بۆ ئەوەی کەرکووك بپارێزن لە کاولکاری و داگیرکاری داعش و شارەکە بە ئاسایی ژیانی ڕۆژانەی خۆی دەبردە سەر.
لە ٢٨ی ئاداری ساڵی ٢٠١٧ ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکووك بڕیاریدا لەسەر پرسی هەڵکردنی ئاڵای کورستان لەپاڵ ئاڵای عێراق لەسەر باڵەخانە و دەزگا حکومی و ناحکومییەکان بە زۆرینەی ئەندامانی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکووك بێ بەشداریکردنی ئەندامانی عەرەب و تورکمانەکان.
بەپێی ناوەڕۆکی دەستووری عێراق مافی خۆیانە داوا بکەن ئاڵای کوردستان لەسەر فەرمانگەکانی کەرکووك و هەموو ناوچە جێناکەکان بەرز بکرێتەوە.
پرسی هەڵکردنی ئاڵای کوردستان، پرسێکی زۆر گرنگە، قسە و لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرێت و دەکرێت بڵێین دوو ڕەهەندی هەیە، یەکەمیان دەستوورییە و ئەوی دیکەیان سیاسی و نیشتمانییە.
سەبارەت بە ڕەهەندە دەستوورییەکە، بەم بڕیارە ئیدی کۆتایی بەو مشتومڕە دێت کە قۆناغەکانی ماددەی ١٤٠ جێبەجێدەکرێت یان نا، ئەم هەنگاوە بەشێکی گرنگی ماددەکە جێبەجێ دەکات.
دیوەکەی دیکەی سیاسی و نیشتمانییە، ئەم شارە لە ڕووی مێژووییەوە کوردستانییە و بە درێژایی مێژووی بەیەکەوە نووساندنی پارچەکانی عێراق لە ساڵی ١٩٢١ کورد قوربانییەکی زۆری لەو پێناوەدا داوە، بە تایبەتیش کەرکووکییەکان کە دەردی تەعریب و زەوتکردنی موڵك و ماڵ و ئاوارەییەکی تاڵیان چەشت، دیوە سیاسییەکەی پەیوەندی بە یەکێتیش نیشتمانی کوردستانەوە هەیە، چونکە هەم پارێزگاری شارەکە ئەندامی مەکتەبی سیاسییەتی و خاوەن بڕیارە لەو شارەدا، هەمیش لە کۆی ٨ی کورسی پەرلەمانی عێراق ٦ی یەکێتییە، واتە لە ٧٥٪ی دەنگی لیستی کوردستانیی لە شارەکە دەنگی یەکێتییە، بۆیە پێویست دەکات زۆر بە وریاییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم پرسەدا بکات.
هەروەها هەڵکردنی ئاڵای کوردستان دەرفەتی موزایەدەی سیاسیی لەبەردەم هەندێ لایەن کەمدەکاتەوە، ئەگەر تا ئێستا خۆیان بە عەرەبی سەربەخۆیی وەسفدەکەن، ئەوا پێویستە ئێستا قسەیەکیان لەسەر کەرکووك هەبێت.
بەڵام هەموو ڕەهەندەکان چەواشەکراو و حکومەتی عێراق لەجیاتی ئەوەی هەنگاو بنێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، هەنگاوی گەورەیان نا بۆ ئەوەی چارەسەری سەربازی باشترین چارەسەر بێت، هەر بۆیە دەرهاویشتەکانی لە ١٦ی ئۆکتۆبەردا دەنگی دایەوە و کەرکووکی بەرەو هەڵدێر برد.
هەروەها جارێکی تر لە ڕۆژی ٨ی کانوونی دووەمی ٢٠١٩ یەکێتی نیشتمانی کوردستانی هەستا بە هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لەسەر مەڵبەند و مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەکان بەڵام لە دواجاردا بەپێی ڕێکەوتنێك تەنها لەسەر مەڵبەندو مەکتەبی سیاسی مایەوە، کە دەرهاویشتەی کۆمەڵێك کێشەی ناوخۆی کورد و عێراق ڕەنگدانەوە و بەرپەرچدانەوەی بەخۆیەوە بینی، بەڵام بە شێوەیەکی نەرمتر لە جاری پێشوو.

* سەرچاوە و پەراوێزەکان:-

- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (٧٢٢٢)، ڕۆژی ١٩ی ئاداری ٢٠١٧، کەرکووك و ئاڵا، سەرتیپ جەوهەر.
- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٧٢٣١ ڕۆژی ٣ی نیسانی ٢٠١٧، نەوت و ئاڵاکەی کەرکووك، خەڵەف غەفوور.
- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٧٢٣٠ ڕۆژی ٢ی نیسانی ٢٠١٧، ڕەهەندەکانی هەڵکردنی ئاڵا لە کەرکووك، کاروان یارەویس.

*** ڕووداوەکانی کەرکوك لە پێش و پاشی (١٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠١٧:-**

ئەوەی جێگەی سەرنجە کە بۆ ماوەی چوار ساڵ دەچێت کەرکوك کەوتووەتە چوارچێوەیەکی ئەوتۆ کە لەلایەن هێزە کوردی و حیزبەکانییەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەڕێوەدەبرا، کە تا ڕادەیەکی بەرچاو هێز و سووپای عێراق لەگەڵ هاتنی (داعش) لە کەرکوك و دەروروبەری کشانەوەی پێشمەرگە ئەو ناوچانەی دەپاراست لە ڕووی سیاسی و سەربازییەوە تا ڕادەیەك لەڕووی کارگێڕییەوە کۆنترۆڵی گەلێك لە چەمکەکانی ژیانی ئەم شارەیان کردووە. هەر لەگەڵ هاتنی داعشدا دۆخێکی تایبەتی بەسەر کەرکوکدا هات، کە هەم دۆخی شەڕ و هەم دۆخی ئارام و سەقامگیری بوو کە شارەکەی خستە سەر ڕێڕەوێکی تایبەتی ئەوتۆ کە هاوگونجاوی سەردەم و کاتێکی دیاری کراوبوو.

هەموو ئەو هێرشانەی داعش کە دەیکردە سەر شارەکە، لەلایەن هێزی پێشمەرگەوە بەرگری لێدەکراو، لەم بوارەدا پێشمەرگە شەهیدێکی زۆری داو قوربانی هەموو کوردستان لەم شارەدا بووە، بۆیە تەنها چەند ناوچەیەکی کەم بە دەست داعشەوە بوو، هەموو شارەکە بە ئارامی دەژیان و خەمی هێرشی داعشیان نەبوو.

بەپێی ئەو ژمارانەی کە لەبەر دەستدایە نزیکەی (٩٠٠-١٠٠٠) پێشمەرگە لەم شارە لە هەموو بەرەکانی جەنگ شەهید بوون، کە زۆربەیان خەڵکی کەرکوك و شارەکانی دیکەی کوردستان بوونە، کە بەرەکانی جەنگ لە سلێمان بەگەوە تا دووبز درێژ بووبووە.

ئەوەی جێگەی سەرنج بوو، لەپای هەموو ئەو بەرگری و خۆبەخشییەی کە کورد دەیدا لەم شارە، هەر یەکە لە عەرەب و تورکمان و مەسیحی، هیچ هەڵوێستێکیان نەبووە، بەڵکو هەردەم هەوڵی ئەوەیان داوە، کە پڕوپاگەندە و ئاژاوەیان دۆزیوەتەوە و بێ بەرامبەر کێشەیان دروست کردووە، بەڵکو بەشێکیان داڵدەی داعش و ڕێکخستنەکانیان کردووە و لەنێو شاردا، دەستیان هەبووە لە تەقینەوە و کاری گێرەشێوێنی.

ئەم دۆخە بەردەوام بوو تا کار گەیشتووەتە ئەوەی کە موسڵ ڕزگار کرا، بارودۆخەکە بە جۆرێکی تر گۆڕاو، حکومەتی عێراق، هەڵوێستەکانی گۆڕا بەتایبەتی لەدوای هەڵبژاردنی بۆ ڕاپرسی و سەربەخۆیی کوردستان، کە کەرکوکیش هەرچەند لەگەڵ ڕاپرسی نەبوو، بەڵام کەوتە ژێر کاریگەریی سیاسەتی کوردستان و ملی دا بۆ هەڵبژاردن و ڕاپرسی، بۆیە هەر بە پەلە حکومەتی عێراق، بە مانای ڕزگارکردنی (حەویجە) کەوتە کۆکردنەوەی هێزی لە دەوری کەرکوك و مۆڵدانی هێزی لە دەورووبەری شارۆچکەی (حەویجە).

هەموو ئەم گۆڕانکارییانە خۆی دەبینێتەوە لەم خاڵانەی خوارەوە:-

١- هەڵوێستی دەوڵەتە ئەوروپییەکان و ئەمریکا دەربارەی ڕاپرسی کە لەگەڵ ئەو هەڵبژاردنەدا نەبوون، کە ئەمە دەستی حکومەتی عێراق واڵاکرد بۆ ئەوەی بێتە کوردستان لە هەمان کاتدا گڵۆپی سەوز بوو، کە تا بتوانێ هەرەس بە ئەزموونی هەرێمی کوردستاندا بێت.

٢- لەپێشدا عێراق شەڕی داعشی دەکرد و سەرقاڵ بوو بۆیە نەدەپەرژایە سەر کێشە ناوخۆییەکان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بەڵام لەدوای ڕزگارکردنی بەشێکی زۆری خاکی عێراق لە داعش، دەستی واڵابوو بەوەی بپەرژێتە سەر فراوان خوازییەکانی کوردستان و باشترین هەنگاوبوو بۆ ئەوەی دەستی واڵابێت بەرەو کەرکوك.

٣- هێز و میلیشیا شیعییەکان دەست دەکەن بە چەکدارکردنی خۆبەخشە ناوخۆییەکان لەو ناوچانەی کە لەلایەن پێشمەرگەوە ئازادکراون و لە ڕیزی گرووپەکانیان ناویان تۆمار دەکەن و یەکەی سەربازیی تایبەتیان بۆ دەکەنەوە، چونکە پێیان وایە گرنگ نییە کێ ئەو ناوچانەی ئازاد کردووە بەڵام پێویستە لەژێر ئیدارەی حوکمڕانیی حکومەتی ناوەندیدا بێت.

٤- دروستبوونی هێزەکانی حەشدی شەعبی زادەی قۆناغێکی تایبەتی ئەمن و سیاسی عێراق بوو کە تیایدا سوپای عێراق لە بەرامبەر هێرشە تیرۆریستییەکانی ڕێکخراوی داعش لە باکووری عێراق شکستی هێنا، هەروەها ئەم میلیشیایانە بە فەرمی شەخسی و مەیدانی و بە ئەجینداى ئەقلیمی بە تایبەتی ئێران کار دەکەن.

٥- ئێران تاکە وڵاتە کە بە ئاشکرا پشتیوانی لە گرووپ و میلیشیا شیعەکانی عێراق دەکات، بۆیە دەتوانێ بە ئاسانی بۆ جێبەجێکردنی ئەجیندای سیاسی خۆی ناڕاستەیان بکات، بەتایبەت کاتێك (تاران) بە ئاشکرا ڕەتی کردەوە دان بە ڕیفراندۆمەکەی هەرێمدا بنێت و هۆشداریی سیاسی و ئەمنی داوە بە هەرێمی کوردستان.

بۆیە یەکێك لە ئامرازە سەربازی و ئەمنییەکانی تاران لە بەرامبەر ئەنجامدانی ڕیفراندۆم بەکارهێنانی میلیشیاکان بێت بۆ هێرشکردنە سەر هێزەکانی پێشمەرگە و دروستکردنی نا ئارامی لە ناوچە جێناکۆکەکاندا.

٦- کەمینە و پێکهاتە ئایینی و نەتەوەییەکانی کەرکوك، نەگەیشتوونەتە ئەو ئاستەی دان بە سەربەخۆیی کوردستان بنێت یان تەجروبەی کوردی لەگەڵیان نەگەیشتووەتە ئەو ئاستەی دڵنەواییان وەرگرتبێت لەلایەن کوردەوە بۆ خزمەتکردنی فەرمانڕەوایی کوردستان.

لە دوای ٢٥ی ئەیلوولەوە کە هەڵبژاردن بۆ سەربەخۆیی کرا، بارێکی نائاسایی و دژواری بەسەر کورستاندا هێنا کە بەتایبەتی کەرکوك و ناوچە جێ ناکۆکەکان گەیشتە ئاستێکی ئەوتۆ کە بۆنی شەڕێکی نەگریسی لێدەهات.

ماوەی نێوان (١٤-١٦)ی تشرینی یەکەم، کەرکوك و خورماتوو کەوتە بارێکی ناگونجاو و هێزی سەربازی لە هەموو لایەکەوە مۆڵدرایە ئەم ناوچانە و بە ئاشکرا حکومەتی عێراق دەنگی هێرشکردنی بەرز کردەوە.

دوای تێکچوونی باری سیاسی کەرکوك و هەرەشەکانی عێراق بۆ هێرشکردن، دوو هەنگاوی سەرکەوتوو کەوتە کار بۆ ڕاگرتنی هێرشکردن، کە هێرشەکەی دواخست بۆ ماوەی

(٣٨) لە ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی لە ماڵی کۆسرەت ڕەسووڵ بڕیاری ئەو پرۆژەیەیاندا بۆ ئەوەی لە ڕێککەوتنی دووکاندا پێشکەشی پارتی دیموکراتی کوردستانی بکەن کە خۆی لە چوار خاڵدا دەبینییەوە:-

١- پێکهێنانی سەرکردایەتییەکی سەربازی هاوبەش لە سنووری کەرکوك، کە پێك بێت لە نوێنەرانی هێزەکانی پێشمەرگە و ئەمریکا و سوپای عێراق کە ئامانجیان بەدەستهێنانی ئاسایش و ئاسوودەیی لەو ناوچانە کە بنکەکەی لەسەر بازگەی (K1) بێت لە کەرکوك.

٢- پێشڕەونەکرنی هیچ هێزێکی سەربازی بۆ ناو کەرکوك.

٣- چارەسەرکردنی هەموو کێشە هەڵپەسێردراوەکانی نێوان هەولێر و بەغدا.

٤- پشتگیریکردنی (UN) و (ئەمریکا) بۆ جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیەو و برگەکانی.

ئەم پرۆژەیە خرایە بەردەم کۆنگرەی دووکان بەڵام بە هەند وەرنەگیراو بایەخی پێنەدرا کە سەرۆکی کۆمار و مەسعود بەرزانیش ئامادەبوون، کە لە کاتێکدا لەلایەن سەرۆك وەزیرانی عێراقەوە پێشوازی لێکرابوو.

بەڵام نە لە ڕێکەوتنی دوکان و نە سەرکردایەتی یەکێتی و پارتی هەرەشەکانی عێراق بە هەند وەرگرنەگیرا نە ئەو ئەگەرانەی لەبەرچاو گرت کە لایەنە ناوخۆیی و ئەقلیمییەکان وەکو تورکیا و ئێران دەستیان هەبوو لە بە ئاراستەبردنی ڕەوتی ڕووداوەکان بەو شێوەی دیمان کە خۆی دەبینێتەوە لەم کاریگەرییانەی خوارەوە:-

١- پاش شەڕێکی چەند سەعاتی لە خورماتوو و کەرکوك پێشمەرگە کەوتە کشانەوەی هێزەکانی لەو ناوچانە و خەڵکەکەیان دایە دەستی قەدەرێکی نادیار.

هەر لەدوای کشانەوەی هێزی پێشمەرگە گەلێك سیناریۆ و بەڵگەنامەی جۆراوجۆری ڕێککەوتننامە بڵاوکرایەوە کە لەلایەن یەکێتی نیشتمانی و ئێران و عێراق ڕێککەوتنیان کردووە و کاریان کردووە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان.

ئەوانەی کە لەگەڵ هێزەکانی عێراق بەشدارییان کرد بۆ هێرشکردنەکە بریتی بوون لە پاسداری ئێرانی و حەشدی شەعبی و هێزی سوپای ئیتیحادی و دژە تیرۆری عێراقی بۆ سەر کەرکوك و خورماتوو.

لەدوای داگیرکردنی کەرکوك لەلایەن سوپای عێراق، ئەو زانیارییانەی بڵاوبووەتەوە دەربارەی ئەو ڕێکەوتنەی لەنێوان سەرکردەی مەیدانی حەشدی شەعبی هادی عامری و پاڤێل تاڵەبانی بەسەرپەرشتی قاسم سولەیمانی و حەیدەر عەبادی کە برگەکانی ڕێکەوتنەکە بەم شێوەیەیە:-

١- مۆڵدانی هێزەکانی عێراق لەو ناوچە کوردستانییانەی دەرەوەی هەرێم لە ناوچە کێشە لەسەرەکانی ماددەی ١٤٠.

٢- ڕادەستکردنی ١٧ یەکەی کارگێری لە قەزاو ناحییەکانی کەرکوك بۆ دەسەڵاتی فیدراڵی کە لەلایەن حکومەتی عێراقی جێبەجێدەکرا لە ڕووی کارگێرییەوە هەر لە ساڵی ٢٠١٤ەوە ئەگەر هاتوو ڕادەست نەکرێتەوە ئەوا دەبێت یانزە یەکەی ئیداری تریش ڕادەست بکەن کە هەر لە ساڵی ٢٠٠٣ەوە لەژێر دەستیاندا بووە.

٣- بەڕێوەبردنێکی هاوبەش لە ناوەندی پارێزگا جێبەجێ بکرێت کە ١٥ گەڕەك بۆ کورد و ٢٥ گەڕەك بۆ پێکهاتەکانی تر بۆ ماوەی شەش مانگ.

٤- ناوچە گرنگە ستراتیژییەکانی کەرکوك لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی عێراقی دەبێت وەکو بنکەی کەیوان و فرۆکەخانە و بیرە نەوتەکان.

٥- گەڕانەوەی هێڵی فرۆکەوانی سلێمانی.

٦- پێدانی مووچەی فەرمانبەرانی سلێمانی و کەرکوك لەلایەن حکومەتی ناوەند.

٧- پێدانی مووچەی پێشمەرگەی سلێمانی.

٨- دامەزراندنی هەرێمێکی تازە بەناوی سلێمانی - کەرکوك و هەڵەبجە.

٩- دروستکردنی حکومەتێکی تازە بۆ هەرێمەکە.

بەڵام هەموو ئەم ڕێککەوتنانە نەکەوتنە بواری جێبەجێکردن و بەشێوەیەکی ئەوتۆ جێبەجێکرا کە لە بەرژەوەندی کوردستان و کەرکوك نەبوو، کە کەرکوکی خستە دوو ڕێیانێکی گەورەوە کە چەند دەرهاویشتەیەکی نارێك و چەوتی لێکەوتەوە:-

١- کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆری کورد بۆ دەرەوەی شارەکە بەتایبەتی لەلایەنگرانی پارتی دیموکراتی کوردستان، یان ئەوانەی کە لە ناوچەکانی کە تێکەڵاوی کورد و نەتەوەکانی تریانی تێدایە، هەرچەندە بەشێکیان دوای چەند ڕۆژێك گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان بەڵام بەشێکیان ئاوارەی شارەکانی سلێمانی و هەولێر بوون.

٢- هاتنە ژوورەوەی هێزێکی زۆری عێراقی بەتایبەتی (حەشدی شەعبی) کە بە هەمەرێکی زۆر لەسەر شەقامە گشتییەکان بڵاوبوونەوە، کە بۆ ماوەیەکی زۆر درێژەی کێشا.

٣- داگیرکردنی هەموو بارەگاکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە کەرکوك یان سووتێنراوە یان تاڵانکراوە و کراوەتە بارەگای جۆراجۆری (حەشدی شەعبی).

٤- لادانی بەشێك لەو بەڕێوەبەرانەی کە لەسەر لیستی پارتی دیموکراتی کوردستان بوونە و نەگەڕاونەتەوە سەر کارەکانیان.

٥- دەنگۆی جۆراوجۆری تۆقێنەرانە لەنێو شارەکە بۆ ترساندنی کوردی شارەکە، بەتایبەتی لەلایەن تورکمانەکانی کەرکووکەوە، کە بەشێکی بە فیتی ئەوان جێبەجێ دەکراو ئامانجەکانیان دەهێنایە دی.

٦- دەنگۆی ئەوەی پارێزگای کەرکوك بە وەکالەت کار دەکات بەهێنانی خەڵکێکی زۆری عەرەب بۆ کەرکوك، یان ئەوانەی بەپێی ماددەی ١٤٠ پارەی قەرەبوویان وەرگرتووە و گەڕاونەتەوە.

٧- گۆڕینی بەشێکی زۆری عەرەب بە گواستنەوەی باری شارستانیان بۆ کەرکوك.

٨- دووفاقی تورکمانەکان لە کەرکوك، ئەوەندەی تر باری شارەکەی ئاڵۆز کردووە و ئاستەنگی دروست کردووە لە پێناو هەڵبژاردنی پارێزگا و ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك کە هەر خۆیان ناکۆکن لەپێناو هەڵبژاردنی یەکێك بۆ ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك.

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەی پێبکەم ئەوەیە کە (مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە) کە تورکمانەکان لە رابردوودا لە رووداوەکەی ساڵی ١٩٥٩ کە هەڵدەستان بە سکاڵای ناهەق و جۆراوجۆر دژی کورد، ژمارەیەکی زۆری خەڵکیان لە شارەکە دەربەدەر کرد، بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە کەسایەتی نیشتمانپەروەی کورد بوون و پێگەیەکی تایبەتی و بەرچاویان هەبوو لە دەزگاو شوێنە تایبەتییەکانی پارێزگاکە کە بەشێکی ئەوانە بە ناهەق دەستگیر کراون و دراونەتە دادگا و حوکمی جۆراوجۆریان بەسەردا سەپێنراوە.

بۆیە لە دوای ١٦ تشرینی یەکەم هەمان خوویان بەکارهێناو لە دادگا و پۆلیس سکاڵاکردن دژی کورد لە هەموو پێکهاتەکانی لەم شارە، بەشێکی زۆری ئەم سکاڵایانە ناهەقی و بێ بنەمایە، کە زۆربەیان (بەرەی تورکمانی عێراقی)یە لە کەرکوك پشتگیری و هاندەریانە و بەڵگەی بێ بنەمایان بۆ دەهێننەوە بۆ ئەوەی کوردەکە زیاتر شارەکە چۆڵ بکەن.

٩- عەرەب و تورکمان لە هەوڵی ئەوەدان کە هەر یەکە لە پارێزگار و ئەنجوومەنی پارێزگا، هەڵنەبژێردرێت یان نەهێڵن کورد ئەو دوو پۆستە بەدەست بهێنێت و هەڵبژاردن نەکرێت تا ئەو کاتەی کار دەکەن بۆ ئەوەی خۆیان گردبکەنەوە بۆ ئەوەی ببنە هێزێکی گەور بۆ هەڵبژاردن دژی کورد.

١٠- تورکمانەکانی کەرکوك هەمان مێژووی ساڵی ١٩٥٩ یان دووبارە کردەوە و وەفدێکیان نارده بەغدا، بۆ سکاڵاکردن دژی کورد بۆ ئەوەی بارودۆخەکە زیاتر دژوار بکەن.

١١- بەشێك لە عەرەبەکانی ماددەی ١٤٠ی تەعریب گەراونەتەوە گوندەکانی سەرگەران و دوویز و نزیکەی (٢٠٠) ماڵ دەبن و داوای زەوی و خانووەکان دەکەن، ئەم کارانەش بەسەرپەرشتی پارێزگاری بە وەکالەت راکان جێبەجێ دەکرێت، بەڵام لەگەڵ خەڵکەکەدا رووبەڕووبوونەتەوە و کێشە کەوتووەتە نێوانیانەوە.

ئەگەر بێتوو ئەم کارە بەم شێوەیە بەردەوام بێت گەلێك ئاژاوەی جۆراجۆری لەم شێوەیە روودەدات لەلایەن عەرەب و تورکمان و کورد.

هەروەها عەرەبە هاوردەکان هەڵیانکووتاوەتە سەر ماڵەکانی (عمل شعبی) و داوای چۆڵکردنی خانووەکانیان دەکەن، بەڵام زۆری ئەم کارانانە چووەتە چوارچێوەی هەرەشە و چاوسوور کردنەوە.

١٢- سەرچاوە عێراقییەکان بەتایبەتی سەربازییەکان گەیشتوونەتە ئەو راستییە کە چۆڵکردنی کەرکوك لە هێزی پێشمەرگە بۆشاییەکی گەورەی سەربازی کردووە، چوونکە هێزی پێشمەرگە زانیارییەکی زۆریان هەبوو لەسەر داعش و ژمارە و خێزان و چالاکییەکانیان لەناو حەویجە و ریاز بەڵام سووپای عێراق لەم زانیارییانە زۆر کۆڵەوارە.

هەر لەم رووەوە لە ١٩ی شوباتی ساڵی ٢٠١٨ هێزێکی گەورەی حەشدی شەعبی لە گوندی سەعدونییە لە ریاز کەوتنە کەمینی داعشەوە کە لە ئەنجامدا ٢٤ کوژراو و ٢٠ رفێندراو هەیە لەگەڵ سووتاندنی ٨ ئۆتۆمبێل و رفاندنی ٨٠ ئۆتۆمبێل کە ئەمە لەدوای ١٦ی ئۆکتۆبەرەوە گەورەترین گورزی داعشە لە حەشدی شەعبی دراوە.

هەروەها حەشدی شەعبی ٤٠٠٠ هەزار پارچە چەکی جۆراوجۆری سەربازییان بەجێهێشتووە و کەوتووەتە دەستی داعش هەر لەنێو کەرکوکدا شوێنی کۆمەڵێك چەکی رێکخستنەکانی داعش گیراوە، هەروەها سێ بریندارییان لەنێو نەخۆشخانەی (الجمهوري) گیراوە.

هەر ئەمەش وای کردووە کە گەلێك شانەی نووستوویان لەناو شار و شوێنە گشتییەکان سەریان هەڵداوە و رێژەیەکی زۆریان خۆیان حەشار داوە و جموجۆڵی نهێنی خۆیان دەست پێدەکەنەوە، کە یەکێك لەسەرکردەکان (حەشدی شەعبی) دانی بەوەدا ناوە کە نەیانتوانی لە رووی ئەمنییەوە کەرکوك ببنە رێوە و وەکو پێویست ئاسوودەییان بۆ شارەکە نەگەڕاندووەتەوە.

ناوە ناوە تەقینەوە لە ناوچەکانی حەویجە، ریاز، بە حەشدی شەعبی روودەدات و جار جار سووپا هێز دەنێرێتە ئەو ناوچانە بۆ کۆنترۆڵکردن، بەڵام داعشێکی زۆر بە ٣٠٠٠ هەزار کەس دەخەمڵێندرێت کە تا ئێستا لەو ناوچانە بەشەوان دەردەچن و بە کەیفی خۆیان خەڵکی دەرفێنن، هەر بۆیە ماوەیەك رێگای (حەویجە - ریاز)یان کۆنترۆڵ کرد و سووپایان نارد بۆ بەرپەرچدانەوەیان.

لە سەرەتای ساڵی (٢٠١٨)ەوە عەمید شێرزاد کافرۆشی کرایە فەرماندەی فیرقەی (٢٠) و بەشێکی زۆری هێزەکانی سوپای عێراق چوونە دەرەوەی کەرکوك و لە دەوروبەری نیشتەجێ بوون.

لە هەمان کاتدا گرتن و راوەدوونانی گەنجان و ئازاردان لە کەرکوك بوونی هەبووە، بەتایبەتی ئەگەر بزانن کە ئەو جۆرە کەسانەی سەرکێشیان هەیەو بەدوای کێشەدا دەگەڕێن شوێنی ئازاردان و گرتنی خەڵکی لە ئەنجوومەنی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانە لە شۆراو و لەوێوە هێزێکی سەربازی (سوات) سەرپەرشتی ئەم کارانە دەکات، کە ئازانرێت لە کوێوە راسپاردە و کارەکان وەردەگرێت و چۆن چۆنی بەرنامەکانیان جێبەجێ دەکەن.

١٣- بڕیاری دادگای فیدراڵی عێراقی بە ژمارە ١١٣ لە رۆژی ٢٠ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٨ بەوەی کە کەرکوك ناوچەیەکی کێشە لەسەر نییە و دوو لە دادوەر و ئەندامانی کوردی دادگا واژۆیان لەسەری کردووە.

١٤- لە ماوەی نێوان (١٧-٢٠)ی کانوونی دووەمی ٢٠١٨ گۆڕانکاری لە سوپای عێراق و حەشدی شەعبیدا کراو (الشرطة الفیدرالیة) هاتنە جێگاکانیان و تیپی (٢٠) بەرەو مووسڵ جووڵەی پێکرا.

١٥- ناوە ناوە پارێزگاری بە وەکالەتی شاری کەرکووك هەڵدەستێت بەدەرکردنی بڕیاری دەرکردنی کورد لە گەرەکە کوردییەکانی کەرکووك، بەتایبەتی لە گەرەکی نەرۆز و کوردستان و عەمەل شەعبی و فەیلەق و بەبیانووی ئەوەی کە ئەم شوێنانە خانووەکانیان سەر بە فەیلەقی یەکە و لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە لەلایەن خەڵکی داگیرکراوە.

لە ٢٠ی کانوونی دووەمی ٢٠١٨ بڕیارێکی دەرکردووە لەلایەن پارێزگارەوە دەربارەی گەرەکی نەرۆز و کوردستان بەڵام لە ئێستا بڕیارەکە راگیراوە بەڵام هەر کاتێك بیبیانەوێت

بڕیارەکە زیندوو دەکەنەوە.
هەروەها ناوە ناوە شەڕ و گێچەڵ بە کورد دەکەن بۆ داگیرکردنی زەوییەکانیان بە هێنانەوەی جۆرەها بیانوو و دەرکردنی بڕیاری جۆراوجۆر لەلایەن پارێزگاری بەوەکالەت.
١٦- سەرهەڵدانی بشێوی و ئاژاوە لەنێوان تورکمانی شیعە و تورکمانی سوننە، تەنانەت کار گەیشتووەتە دەستدرێژیی دەکەن و سەر یەکتری و بوختان هەڵبەست ن و چاڵ بۆ یەکتری هەڵدەکەنن لە هەموو بوارەکاندا.
١٧- دوای دوو مانگ بەسەر داگیرکردنی کەرکوک، هێزی پێشمەرگە زۆر هاتوونەتە پێشەوە و لە هەندێک شوێندا تەنها ١-٥ کیلۆمەتر لە کەرکوک نزیکن و ساتر و هێزی تۆکمەیان هێناوەتە ئەو گردانەی کەلێی نیشتەجێ بوونە. تەنانەت لە هەندێک شوێن وەکو لەیلان و خاڵە بازیانی دەمەقاڵێیان بووە لەگەڵ هێزی سوپای عێراق.
ئەم جووڵەیەی هێزی پێشمەرگەش لەدوای ئەوە هات کە هێزی سەربازی لە کەرکوک پاشەکشێی کردووە لە جێگای هێزی پۆلیسی ئیتیحادی فیدراڵی جێگای گرتووەتەوە.
هەر لە هەمان کاتدا بەشێکی زۆری هێزە سەربازییەکە چووەتە دەرەوەی کەرکوک یان دەوروبەری بەتایبەتی لە موسڵ و حەویجە کە داعش و ئاڵا سپییەکان بەشێوەیەکی بەرچاو چالاکییان دەست پێکردووە.
لە مانگی شوباتی ٢٠١٨ەوە ناوە ناوە دەنگۆی ئەوە بڵاو دەبێتەوە کە داعش لە دەوروبەری کەرکوک دەستیان بە جووڵە کردووەتەوە و هەر بۆیە لە ١٨ ی شوباتی ٢٠١٨ هێزێکی حەشدی شەعبی لە گوندی (سەعدونییە) لە ڕیاز کەوتنە کەمینی داعش و نزیکەی ٤٠ کەسیان لێکوژراو و بریندار بوون و ٢٠ کەسیش ڕفێندراوە و ٤٠٠٠ هەزار پارچە چەک کەوتووەتە دەستیان کە زۆربەیان خەڵکی بەسرە بوونە لە پاڵ ئەمەشدا ڕاگەیاندنە جۆر بەجۆرەکان قەبارەی ڕووداوەکان گەورە دەکەنەوە و ئەوەندەی تر دڵەڕاوکێیان لە ناو خەڵکی دروست کردووە بەتایبەتی کەناڵی ڕووداو زۆر بەچڕی بایەخ بەم لایەنانە دەدات، بۆ ڕوومالکردنی ڕووداوەکان لە کەرکوک.
هەروەها لە ٢٦ی شوباتی ٢٠١٨ هێزێکی داعش هەڵیانکوتاوەتە سەر بیری نەوتی خەبازە و سێ پۆلیسی سەر بیرەکەیان کوشتووە.
ناوە ناوەش تەقینەوە لە کەرکوک ڕوودەدا کە بارەگاکانی حشد شعبی دەکاتە ئامانج.
لە مانگی ئاداردا چەند جارێک هەڵکوتراوەتە سەر بارەگاکانی بەرەی تورکمانی تاکو ئێستاش ناسنامەی هێرشبەرەکان نازانرێت.
١٨- شەپۆلی شیعەگەری لە کەرکوک و خورماتوو:-
بەهۆی ڕووداوی ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧ کەرکوک و خورماتوو و ناوچەکانی دەوروبەری ڕادەستی میلیشیاکانی حەشدی شەعبی و حیزبوڵا کرا، هەر لەهۆی ئەو ڕووداوانەوە زیاتر لە (٥٠٪)ی خاکی کوردستانمان لەدەستدا کە بە خوێنی شەهیدان ڕزگارکرا.
میلیشیا تائفییەکان لەبەر کورد دڕێغییان لە ئەنجامدانی هیچ تاوانێکدا نەکرد، ڕاپرسییەکانی ڕێکخراوە ناوخۆییەکان و دەزگا میدیایی و ئاژانسەکانی هەواڵ، هەروەها ڕاپۆرتەکانی ڕێکخراوی ئەمنیی و بەتایبەتی ڕاپۆرتی نێردەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ یارمەتی عێراق - یونامی لە ٢٣ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٧ سەرەڕای کەموکوڕی و بۆشاییەکانی و تێبینییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەسەر ڕاپۆرتەکە لە ٢ی کانوونی دووەمی ٢٠١٨.
نزیك و زیندووترین بەڵگەی ئەو تاوانکارییە دژە مرۆییانەی حەشدی شەعبین کە دەرهەق بە کورد ئەنجامیان داون، دوو ڕۆژ بەسەر داگیرکردنی کەرکوک و خورماتوودا تێپەڕیبوو کە میلیشیا شیعەکان بە هاوکاری چەند لایەنێک، دەستیان هەبوو لە گرتن، ئەشکەنجەدان، ڕفاندن و کوشتنی سڤیل، بە تاڵانبردنی سەروەت و سامان و سووتاندنی ماڵان، تەقاندنەوەی خانوو شوێنی کارو سەرچاوەی بژێوی هاووڵاتیان کورد.
داگرتن و سووتاندنی ئاڵای کوردستان لە تەواوی ناوچەکە، شێواندن و بێ ڕێزیکردن بەدیوار بەندنی شەهیدانی پێشمەرگە و وێنەی سەرکردەکانی کورد، لە بەرامبەر ئەوەدا میلیشیاکانی حەشدی شەعبی لە شەقامەکانی شاری کەرکووکدا وێرای وێنەی سەرکردە شیعییەکان وێنەی عەلی خامەنایی ڕابەری کۆماری ئیسلامییان هەڵواسی.
میلیشیا شیعەکان بە بەرنامە و پیلان، خەریکی جێبەجێکردنی سیاسەتی تەعریب و بە شیعەکردن بوون، ئەویش بە هێنانی عەرەبی شیعە لە ناوچەکانی دیکەی عێراق بۆ کەرکوو، خورماتوو، داقووق و داودە، داگیرکردنی زەوی و زاری کورد لە دەوروبەری و بەخشینی بەو عەرەبە هاوردەکراوانە، هاوکات بە مەبەستی تۆقاندن و ترساندنی خەڵکی ئەو ناوچانە.
مانگی ئابی ساڵی ڕابردوو بە بڕیارێکی ئەنجوومەنی پارێزگای بابل هۆشداری دراوە لەوەی هەر کەس ولایەنێک داوای گەڕاندنەوەی هاووڵاتییانی ناوچەی (جورفولسەخر) لە ٦٠ کیلۆمەتری باشووری بەغدا بکات ئەوا ڕووبەڕووی یاسا دەکرێتەوە، کە ئەو ناوچانە هەر لە (٢٠١٤)ەوە بەدەستی حەشدی شەعبییەوە داگیر کراوە و بەشێکیان لە ئێستادا لە کەرکوک نیشتەجێن، بۆیە دەنگۆی ئەوە هەیە بەشێکیان لە کەرکوک نیشتەجێ بکەن.
هەروەها پۆلیسی فیدراڵی عێراق بە چاودێری حەشدی شەعبی لە سنووری شارەدێی سەرگەران سەر بە شارۆچکەی دووبزی پارێزگای کەرکووك، پرۆسەی دووبارە تەعریبکردنی ناوچەکەیان دەستپێکرد، ئەویش بە هەرەشەپێکردنی گوندەکانی پەڵکانە، شەناغە وسەربەشاخ بۆ ئەوەی خانووەکانیان جێبهێڵن، تاکو لە شوێنی ئەواندا و لەسەر ماڵ و حاڵیاندا عەرەبی کۆچەر لە کە لە بنەڕەتدا خەڵکی ناوچەکانی بەعاج و حەزەر و سنوورەکانی سووریان نیشتەجێ بکەن.
لە کۆتایی مانگی شوباتی ٢٠١٨ ڕاکان سەعید پارێزگاری کەرکووک بە وەکالەت و حەشدی شەعبی، بڕیاری ڕووخاندنی ١٣٠ ماڵی کوردی گەڕەکی نەورۆزی دەرکرد،

لەگەڵ ئاراستەی بڕیاری تەعریب بۆ لایەنە پەیوەندیدارەکان.
دواجار بەخشینی بڕیاری حەیدەر عەبادی بەزەوی بۆ چەکدارانی حەشدی شەعبی لەناو شاری کەرکووک، کە ئەم بڕیارە لەلایەن محەمەد مەهدی ئەلبەیاتی بەرپرسی میلیشیای حەشد لە کەرکوک ڕاگەیەندرا کە کاردانەوەیەکی توندی لەلایەن کورد و سوونەوە لێکەوتەوە.
لەسەرەتای مانگی کانوونی دووەمی ئەمساڵ (٢٠١٨)، ڕێژەی چالاکییەکانی داعش بەراورد بە ساڵی ڕابردوو، لە سنووری قەزای حەویجە و دەروووبەری زیاتر بوون، بەشێوەیەکی بەردەوام پێکدادان لەنێوان هێزە سەربازییەکانی عێراق و چەکدارانی داعش ڕوو دەدات.
ماوەیەکی زۆرە هێزە ئەمنییەکان کشانەوتەوە بۆ نزیك شەقامی سەرەکیی کەرکوك – بەغدا و ناوچەی حەفتەغاریان بەجێهێشتووە.
چەکدارانی داعش ئەم بۆشاییەیان قۆستووەتەوە و بەشێوەیەکی ئازادانە لە ناوچەکەدا تەراتێن دەکەن، ژمارەیەکی زۆر چەکدار بە ئۆتۆمبیلەوە هاتنە گوندەکانی حەفتەغار و بۆ ماوەیەك مانەوە و دواتر کشانەوە.
هەروەها حکومەتی عێراقی لە ڕێگەی فڕۆکەی جەنگییەوە بارەگایەکی داعشی لە گوندی (سماقەی خواروو) سێ کیلۆمەتر خواروو (حەفتەغار) بۆردوومان کرد، کە ژمارەیەکی زۆر داعشی لێ بوو بۆ هێرشکردنە سەر هێزە عێراقییەکان.
سەرەڕای ئەوەی حکومەتی عێراق بۆ پاراستنی دامەزراوە نەوتییەکان کە بە زۆری کەوتووەتە سنووری ڕۆژئاوای کەرکوك هێزێکی زۆری ڕەوانەی قەزای دووبز و دەروووبەری کرد، بەڵام زانیارییەکان ئەوە دەردەخەن کە لەوێش شکستیان هێناوە لە کۆنترۆڵکردنی ناوچەکە.
دیارترین چالاکییەکانی چەکدارانی داعش لەو سنوورە، دانانی بازگەیەکی وەهمی بوو لەسەر ڕێگای کەرکوك– دووبز کە بەو هۆیەوە ژمارەیەك هاووڵاتی و کارمەندی هێزە ئەمنییەکان و پۆلیسی پاراستنی نەوت بوونە قوربانی.
هەروەك توانیان بە جلوبەرگی سەربازییەوە دزە بکەنە یایچییەوە کە نزیکترین ناحیەیە لە کەرکوکەوە و چەند تاوانێکی قێزەوەن ئەنجام بدەن.
ئەگەرچی سنووری ڕۆژهەڵاتی کەرکوك ئارامترین شوێنی کەرکوك بوو لە ساڵی ٢٠١٧دا بەڵام لەدوای کشانەوەی هێزەکانی پێشمەرگە، چەکدارانی داعش دزەیان کردووەتە سنوورەکەو لە ئێستادا وەکو سەرچاوەی جموجۆڵەکانیان بەکاری دەهێنن.
چەکدارانی داعش بە درێژایی چەمی ڕۆخانە و دۆڵ و شیوەکانی ناوچەکە بوونیان هەیە و بە ئاشکرایش لەلایەن گوندنیشن و شوانی سنوورەکە دەبینرێن.

* سەرچاوە:-
* مەترسییە ئەمنییەکانی ڕیفراندۆم لە هەرێمی کوردستان ص ١٢.
* الانصات، ژمارە ٦٧٥٠ ڕۆژی ٢٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠١٧،ل١.
* ڕۆژنامەی باس، ژمارە (٣٧٣) لە ڕۆژی ٦ی ئاداری ٢٠١٨ لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی بە شیعەکردنی کەرکوك و مووسل، نووری بێخاڵی.
* ڕۆژنامەی ئاژانس، ژمارە ٨٧، ٩ی مایسی ٢٠١٨.

*** خورماتوو... جینۆسایدی نەتەوە و شارێك**

خورماتوو یەكێكە لەو دەڤەرە كوردستانییانەی كە هەردەم پارچەیەكی دانەبڕاوی كوردستان بووە و خەڵكەكەی خەبات و تێكۆشانیان كردووە لەپێناو كوردستاندا.
قەزای خورماتوو دەكەوێتە حەفتاو چوار كیلۆمەتر لە باشووری كەركوك، لە ساڵی ١٩٧٢ بە بڕیارێكی حكومەتی عێراقی لە كەركوك دابڕێندرا و خرایە سەر پارێزگای سەلاحەددین.
بەپێی ئاماری فەرمانگەی سەرژمێری پارێزگای سەلاحەدین سەدو هەشتا هەزار كەسە كە زۆرینەیان لە پێكهاتەی كورد و توركمانن.
ناكۆكییە چەكدارەكانی سێ ساڵی ڕابردووی عێراق زۆر شارو ناوچەی وێرانكرد، بەڵام وێرانی و ئاوارەیی خورماتوو لەوانەی تر جیاوازترە، چونكە بەهۆی ناكۆكی چەكداریی دوو لایەنەوە ڕوویدا كە پێشتر لە یەك بەرەدا شەڕی داعشیان دەكرد.
قەزای خورماتوو لە خوارووی كەركووك زیاد لە جارێك بە یەككەوتنی نێوان هێزی پێشمەرگە و حەشدی شەعبی تیایدا ڕوویداوە، دانیشتووانی ئەو شارە لە كورد و توركمان و عەرەب بە هەردوو مەزهەبی سوننە و شیعەوە چەندین ساڵە بە ئاشتی پێكەوە دەژین، كەچی ناكۆكی هێزە سیاسییەكان ئەمجارە ئەوانیشی پەلكێشكردە ناو ململانێیەكەوە.
كاتێك لە ئۆكتۆبەری ساڵی ٢٠١٧ بۆنی ڕووبەڕووبوونەوەی هێزە عێراقی و كوردییەكان دەكرا، یەكەم پریشكی ئاگرەكە شەوی (١٤)ی تشرینی یەكەم لەو قەزایەوە دەستی پێكرد، دوو ڕۆژ شەڕی پچڕپچڕ لەو قەزایەدا هەبوو، دواتر پێشمەرگە چۆڵی كرد و هێزەكانی حەشدی شەعبی و سوپای عێراقی چوونە ناو قەزاكە، بەو هۆیەوە ژمارەیەكی زۆر لە خەڵكەكەی ئاوارەبوون و بەدەیان دوكان و ماڵ سووتان و تاڵانكران، بێ ئەوەی بكەرەكەیان دیار بێت.
دانیشتووانی خورماتوو، دوای هەڵاتنیان ماڵەكانیان سووتاوە و ئێستا لە كەلار نیشتەجێن، بەهۆی كەمتەرخەمی بەرپرسانی ئیداری و چارەسەرنەكردنی دۆخی خورماتوو لەلایەن حكومەتی ناوەندو هەرێم هەر لە ساڵی ٢٠٠٩ خەڵكی خورماتوویان لە شەڕدا یان لە ترسی هەڕەشەكان ئاوارەی پارێزگاكانی هەرێمی كوردستان دەبن.
بەپێی ئامارێكی نافەرمی كە لە سەرچاوەیەكی ئیدارەی قەزای خورماتوو لە لایەنی كوردییەوە دراوە بە ڕاگەیاندنەكان، ٢٢٥ خانووی هاووڵاتیان و ١٥٠ دوكان ٥٣ خانووی بەرپرسە باڵاكانی پێشمەرگە و پۆلیس و بەڕێوەبەر كوردەكانی ئیدارەی خورماتوو لە گەڕەكەكانی كۆماری، عەسكەری، جەمیلە، برایەتی، دوای تاڵانكردنیان یان سووتێنراوە یان تەقێنراوەتەوە، ئەمە جگە لەوەی زیاتر لە پەنجا هەزار هاووڵاتی ئاوارە بوون... هەروەها هەژدە پێشمەرگەش بە دیل گیراوە و دواتر ئازاد كراوە.
ئەمە یەكەم جار نییە ئەم ڕووداوانە لەم قەزایەدا ڕوودەدات بۆ نموونە:-
ڕۆژی (١١)ی نۆڤەمبەری ساڵی ٢٠١٥ بۆ ماوەی حەڤدە ڕۆژ شەڕی پچڕ پچڕ لەنێوان پێشمەرگە و چەند گرووپێكی توركمانی حەشدی شەعبی ڕوویاندا كە تیایاندا (٢١) كەس كوژران و ١٣٥ كەس بریندار بوون، ئەوكات وەفدێكی (عەسائیبی ئەهلی حەق) و مەكتەبی سیاسی یەكێتی لە سلێمانی كۆبوونەوە بە مەبەستی ڕاگەیاندنی ئاگربەست تاكو دۆخی ئەمنی شارەكە هێور بكرێتەوە، ئەو ئاگربەستە بۆ ماوەی شەش مانگ كاری پێكرا و لەسەرەتای حوزەیرانی ساڵی ٢٠١٦ بۆ ماوەی چوار ڕۆژی تر شەڕ و پێكدادان لەنێوان هێزی پێشمەرگە و چەكدارانی حەشدی توركمانی بەردەوامی هەبوو، دواتر بەبێ ڕێكەوتن ڕاگیرا..

حەشدی توركمانی زیاتر لە دوو هەزار ماڵیان تاڵانكردووە، ١٠٠ خانوویان سووتاند، ٤٠٠ مۆڵ و دوكانیان گرتێبەردا، ١١ كارگەی گەورە و بچووكیان تاڵانكرد، هەر بەهۆی ئەو شاڵاوە درندەیەوە زیاتر لە ٥٠ هەزار هاووڵاتی كوردی ڕەسەنی قەزاكە ئاوارەبوو.
- ژمارەی شەهیدەكان:- ٢ هاووڵاتی، ٧ پێشمەرگە.
- برینداربوون:- ١١٥ كەس لە دانیشتووان و هێزی پێشمەرگە.
- دەستدرێژی بۆ سەر چوار ئافرەت كە حاڵەتێكیان بە فەرمی لە بنكەی پۆلیس تۆمار كراوە.
- تاڵانكردن و سووتاندن، شێواندنی زیاتر لە ٣١٥٠ ماڵی هاووڵاتی كورد.
- تەقاندنەوەی ٥٣ شوێنی بازرگانی و دووكان.
- تاڵان و سووتاندنی ١٥ بارەگای حیزبە كوردییەكان.
- تاڵانی شەش دامەزراوەی حكومی سەر بە كوردستان.
- تاڵانكردنی چوار ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی لۆكاڵی كوردی.

* سەرچاوەكان:-
* كوردستانی نوێ، ژمارە (٧٤١٥ ڕۆژی ١٣ی تشرینی یەكەمی ٢٠١٧، لاپەڕە (٢)

***گرووپێکی توندڕەوی تر (حازمیون-سوفیانیون): (الرایة البیضاء) ١٩١٧-٢٠١٨:-**

لەم ماوەیەدا ناوەناوە دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەتەوە کە گوایە گرووپێکی چەکدار لەنێوان کفری و خورماتوو بڵاوبوونەتەوە بەتایبەتی بنکەکەیان لە گوندی (پەڵکانە) و (غەرەیە) کە سەر بە ناحیەی نەوجوولە، کە جاران شوێنی کۆمپانیای نەوتی بووە و ئێستا لەلایەن ئەو گرووپەوە دەستی بەسەردار گیراوە.

ژمارەی ئەندامەکانی ئەوانەی کە خەڵکی دیویانە خۆیان دەبینێتەوە لەنێوان (١٥٠-٥٠٠) کەس، کە زۆربەیان لەو دێیانەی کە ئامارەیان پێکرد بڵاوبوونەتەوە، ئاڵای ئەم گرووپە بە پێچەوانەی داعش، ڕەنگی سپییە و شێرێك لەنێو باگراوندێکی سپیدایە.

ئەندامەکانی ئەم گرووپە بریتییە لە کورد و عەرەب، بەتایبەتی عەرەبی سوونەی ئەو سنوورە، کوردەکانیشیان خەڵکی دەیانناسنەوە کە خەڵکی ناوچەکەن بەتایبەتی خەڵکی خورماتوو.

لەم ماوەیەدا یەکێکیان لێکوژراوە بەناوی (حاتەم) کە خەڵکی (سلێمان بەگ) بووە لەپێشدا لە قاعیدە بووە و لەدوایدا بووەتە داعش، ئێستاش سەر بەم گرووپە بووە.

ئەوەی سەرنجی خەڵکی ناوچەکە دەدات، ئەوەیە کە ناوەناوە هەلیکۆپتەر لەسەریان دەنیشێتەوە و چەکیان بۆ دادەگرن و ڕاوێژیان لەگەڵ دەکەن.

هەروەها هاوپەیمانی نێودەوڵەتیش ئەوە ناشارێتەوە کە هەست و باسی ئەو جموجۆڵانەیان بیستووە و ئاگاداری (٥٠٠) چەکدارن لە ناوچەکە، بەڵام ئاماژە بەوە دەکەن کە گوایە عەبادی سەرۆك وەزیرانی عێراق ئاگادارە هێز ئامادە دەکات بۆ سەر ئەم گرووپانە.

هەندێك سەرچاوەی تریش ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم گرووپە بە ئاگاداری ئێران کار دەکات و بەسەر پەرشتی ئەوان و لە بەرژەوەندی ئەواندا کار دەکەن، کە بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی ئەوانەن لە ناوچەکە.

هەندێك لە سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن کە گوایە سەرپەرشتی ئەم گرووپە کەسێکی سوونەیە بەناوی خالید سەبوورییە خەڵکی سەلمان بەگە و دوانزە کوردی تێدایە.

خۆیان ناساندووە بەناوی (جیش أمراء السنه) کە لە خێوەتدان و ئۆتۆمبێلی مەرزییەیان هەیە.

هەندێك سەرچاوەی تر بە (السفیانیین) ناویان دەهێنن، کە هەڵگری هەمان ڕاوبۆچوونی توندڕەوی داعشن.

لە ماوەی نێوان (٣٠-٣١)ی تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠١٧ بۆ یەکەم جار شەڕوپێکدادان لەنێوان ئەم گرووپە و حەشدی شەعبی ڕوویدا لە گوندی جەنبوور لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی داقووق، لە ئەنجامدا سێ لە حەشدی شەعبی کوژراو حەوتیش بریندار بووە، کە گرووپی حەشدی شەعبی کەوتوونەتە کەمینی ئەو گرووپە توندڕەوەوە و ئەو گرووپەیش زیانیان دیار نییە.

لە ماوەی ١٣ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٧ گەلێك پێکدادان و تێکرتنی هاوەن ڕێگری کردن لەنێوان ئەم گرووپە و حەشدی شەعبی ڕوویدا، کە هەشت هاوەنیان گرتە خورماتوو کە بوو بە بریندار بوونی (١٣) کەس و ڕووخاندنی چەند خانوویەك.

هەر لەم ماوەیەدا هەستان بە گرتنی ڕێگای نێوان داقووق و خورماتوو، کە بوو بە ئاگر تێبەربوونی ١١ ئۆتۆمبێلی بار هەڵگری گەورە و (١١)کەسیان ڕفاند کە تاکو ئێستاکە چارەنووسیان دیار نییە، هەروەها بۆردومانی خورماتوویان کردووە و (٥) کەسیان کوشت و (٤٠) کەسیان بریندار کرد.

*** گرووپی (ئاڵا سپییەکان):-**

یەکێکە لەو گرووپە چەکدارانەی کە لەو سنوورە بوونیان هەیە بە ئاڵا سپییەکان ناسراون، ئەو گرووپە ئاڵاکەیان سپییە و وێنەی سەرە شێرێکی تێدایە.

یەکەم دەرکەوتنی ئەو گرووپە دەگەڕێتەوە بۆ دوای ڕووداوەکەی ڕۆژی ٨ی تشرینی دووەم، کە مەفرەزەیەکی ئاسایش لە ناحیەی (زنانە) لەنێوان هەردوو قەزای (کفری) و (خورماتوو) دەکەونە بۆسەی ژمارەیەك چەکدارەوە، دوای ڕووبەڕووبوونەوەیش چەکدارێکی ئەو گرووپەی دەکوژرێت.

بەپێی ئەو زانیارییانەی کە لە ئاسایشدا لەبەردەستن ژمارەی چەکدارەکان لەنێوان (٧٠-٨٠) چەکدار دەبێت و چەکی سووك و مامناوەندیان پێیە و ژمارەیەك ئۆتۆمبێلی جۆری (تۆیۆتا پیکاب) و (ماتۆر سکیلیشیان) هەیە و تەواوی ئەو کەرەستە و کەلوپەلانەیان لە دۆڵەکاندا حەشار داوە.

گوندی (پەڵکانە) بووەتە مۆڵگەی سەرەکیی ئەو گرووپە و لە ناوچەکانی نزیك (زنانە) و (چیای هەنجیرە) و (دەشتاییەکانی غەرە) تا دەگاتە سنووری ناحیەی (سلێمان بێگ) حەشارگەیان هەیە.

بەپێی سەرچاوەکان دەرکەوتووە کە چەکدارانی ئەو گرووپە قسەیان بۆ ژمارەیەك شوانی مەڕومالاتی سنوورەکە کردووە و پێیان وتوون ئێمە بۆ بەرگری لە (سوونە) دروست بووین.

پێشبینی دەکرێت ئەندامانی گرووپی (ئاڵا سپییەکان) پاشماوەی گرووپی داعش بن، کە لەو سنوورە جارێکی تر خۆیان ڕێکخستووە.

زانیارییەکان لە چەند سەرچاوەیەکی هەواڵگرییەوە دەستی کەوتووە:- سەرەتا گرووپی (ئاڵا سپییەکان) خۆیان بە سوپای ڕزگارکەری (سوونە) ناساندووە و دیارترین سەرکردەیان لە پێکهاتەی تورکمانی سوونەی دانیشتووانی ناوچەی بەیاتن.

یەکێك لە دیارترین سەرکردە کوردەکانی گرووپەکە، کە پێشتریش لەریزی داعشدا بووە خەڵکی خۆرهەڵاتی کوردستانە و دوای ماوەیەك لە بۆردومانێکی فڕۆکەکانی عێراقدا لە ناوچەی (پەڵکانە) کوژراوە.

بە وتەی هاووڵاتیانی سنوورەکە لەدوای چەکدارانی ئەو گرووپە چەند جارێك فڕۆکە بینراوە و گومانی هاوکاریکردنی ئەو گرووپەیان لێدەکرێت تاوەکو ئێستا چوار جار فڕۆکەیان بینیوە، جارێکیان سێ دانە بووە و لە جاری سێیەمیشدا هەشت دانە بوون، بەسەر ناوچە شاخاوییەکانی پەڵکانەدا

سووراونەتەوە، بەڵام نەیانبینیوە بنیشنەوە، هەرچەندە هیچ هێمایەکیشیان بەدی نەکراوە، تاوەکو بزانن سەر بە چی لایەنێکن دوای ئازادکردنەوەی قەزای (حەویجە) و دەروروبەری بەشێك لە چەکدارانی داعش توانییان دزە بکەن بەرەو سنووری قەزای (خورماتوو) و لەوێشەوە بە ئاراستەی ناوچەکانی (زنانە) و (نەوجول) و (قادر کەرەم) و (چیای بێرە) و بۆشایی ئەمنیی ناوچەکەیان قۆستووەتەوە و جێگیر بوون.

مەبەستی گرووپەکە لەو هەنگاوەی بۆ پەلکێشکردنی کوردە بۆ شەڕی شیعە و دروستبوونی کێشەی مەزهەبی و نەتەوەییە کە ئێستا بە ئاشکرا دەزگا ئەمنییەکانی عێراق کەوتوونەتە ژێر ئەو کاریگەرییە و مەترسییەکانیشی بۆ سەر کورد گەورە دەبێت بەتایبەت لە ناوچە کێشە لەسەرەکان.

کۆتایی مانگی تشرینی دووەمی هێزێکی چەکداری نامۆ کە لە کورد و عەرەب پێکهاتبوون و ژمارەیان (٦٠) کەس دەبوو، چوونەتە سەنگەرێکی پۆلیسی نەوت و گازی هەرێم.

*** گرووپی (سەلەفی سوفیانی):-**

چاودێرانی ئەو گرووپە پێیاون وایە زۆربەی ئەندامەکانیان پاشماوەکانی حیزبی بەعسن لەو سنوورە، بەپێی زانیارییە هەواڵگرییەکان حیزبی بەعسی لەناوچوو سەرقاڵی پێکهێنانی هێزێکی چەکداریی نوێیە و لە ئێستادا خەریکی کۆکردنەوەی لایەنگر و سەرکردەکانییەتی و بە مەبەستی راهێنانکردنیان دەیانگوازێتەوە بۆ سەر بازگە نهێنییەکانی.

ئەو هێزەی حیزبی بەعس هێشتا خۆیان رانەگەیاندووە و بەشی دووەمی تەواوکەری ئەو گەلە کۆمەیەیە کە بە داعش دەستی پێکرد.

قسەی بەرپرسە ئەمنییەکانی هەردوو پارێزگای سەلاحەدین و دیالە ئەوە دەخەنە روو کە ئەو گرووپەی نزیکی (خورماتوو) لەگەڵ گرووپەکەی سنووری (دیالە) جیاوازن، ئەو گرووپەی بە سوفیانییەکان دەناسرێن زیاتر بەسەر زنجیرە چیای حەمرین و دیالە و باکووری بەغدا دابەش بوون.

هێزەکە زنجیرە چیای حەمرینی وەك سەرچاوەی چالاکییەکانی بەکاردەهێنێت و لەنێوان سنووری دیالە وسەلاحەدین هاتووچۆ دەکەن.

هەروەها لیژنە ئەمنییەکان ئەوەیان خستووەتە روو کە پاشماوەکانی بەعسن و سوپای نەقشبەندی و قاعیدە و سوپای ئیسلامی عێراق لە دیالە و تکریت و بەغدا دەستیان بە جموجۆڵ کردووە و هەوڵی زیندووکردنەوەی شانە نووستووەکانی خۆیان دەدەن کە پێشتر لەگەڵ داعشدا بوون.

شیعەکان گرووپەکەی (دیالە) بە سوفیانییەکان ناو دەبەن هەر چەندە هێشتا بە فەرمی خۆیان رانەگەیاندووە، ناوەکەیان لە گێرانەوەیەکەوە وەرگرتووە کە پێیان وایە ئیمام عەلی کوری ئەبی تالیب لە وتەیەکدا باسی لە سەرهەڵدانی گرووپێك کردووە بەناوی (ئاڵا رەشەکان) کە بە بڕوای ئەوان مەبەستی داعش بووە و پاشان سەرهەڵدانی گرووپێکی تر کە ئاڵای

دێنە عێراق.

ئەو گرووپە نوێیانە زیاتر هەڵگیرساندنی شەڕی تائیفییە و تەنانەت لە شوێنەکان داوایان لە سوپای عێراق کردووە خۆیان لە شەڕی ئەماندا نەگلێنن چونکە ئەوان زیاتر لە دژی شیعە و حەشدی شەعبی شەڕ دەکەن.

بەپێی نووسراوی دەزگا هەواڵگرییەکان گرووپەکە پشتی بەو کەسانە بەستووە کە پێشتر لە ریزی گرووپە توندرەوەکانی دیکەدا راهێنانیان کردووە و بۆ هەموو کردەوەیەك ئامادە کراون.

دیارترین ئەو کەسایەتییەی نێو گرووپی سوفیانییەکان (ئەحمەد حکومە)یە کە بنەچەی خەڵکی پارێزگای دیالەیە، لە ساڵی ٢٠٠٥وە سەرپەرشتی چەکدارانی قاعیدەی کردووە لەناوچەکانی داوێی (حەمرین) و (ئیمام وەیس) و (سەلاحەدین) ئێستا جارێکی تر لە ریزی گرووپی سوفیانییەکان بینراوە.

بەپێی زانیارییەکان ئەم گرووپە کەسێك رابەریەتییان دەکات بەناوی (هیوا نیعمە) کە ناسراوە بە (هیوا کوێر) کە پێشتر چەکداری ئەنسار ئیسلام بووە و خەڵکی کفرییە و تەمەنی ٥٠ ساڵە.

زۆرینەی ئەندامەکانی گرووپەکە مەشق و شەڕیان کردووە و لە پاکستان و ئەفغانستان و راستەوخۆ لەلایەن قاعیدەوە سەرپەرشتی کراون، ژمارەیان حەود سەد چەکدارە و سەربازگەیەکی هەیە و لە دەورووبەری ناحیەی (مەندەلی) سەر بە پارێزگای دیالە.

هەروەها بەپێی زانیارییەکان پێشبینی دەکەن هەردوو گرووپی (ئاڵا سپییەکان- سوفیانییەکان) بە پاڵپشتی یەکتر باکووری میقدادیە (شارەبان) خالس، داوێ، چیای حەمرین و دەورووبەری داگیر بکەن، چونکە بە داگیرکردنی ئەو شوێنانەی دەرگای چوونە ژوورەوەیان بۆ بەغدا دەکاتەوە.

ئەوەی جێگەی سەرنجە لە سەرەتای مانگی شوباتی ٢٠١٨ دا هێزە سەربازییەکانی سوپای عێراق هەستان بە کێوماڵکردنی رێگای خورماتوو تا حەمرین کە گوایە چالاکی داعش لەو ناوچانە هەیە، بەڵام هیچ باسێکی گرووپی ئاڵا سپییەکان بوونی نەبوو، چونکە ئەگەر نزیکەی ١٠٠٠ چەکدار بوونە، جێگەو پێگەی ئەمانە لە کوێیەوە چیان لێهات یان چۆن تەنها کەسێکیان دەستگیر نەکراوە، بۆیە زۆر رێی پێدەچێت تەنها ئەم کێوماڵە بۆ زامنکردنی رێگای نەوتی کەرکووکە بۆ ئێران تا بەوەی بەبێ کێشەکە نەوتەکە رادەست بکرێت. لە هەمان کاتدا هیچ لە دەزگا سیخوڕییەکانی عێراق زانیاری پشت راستیان نەخستووەتە بەردەست دەربارەیان.

ئەوەی جێگەی سەرنجە کاریان بۆ دەست بەسەراگرتنی ئەو بیرە نەوتانە بوو کە بەدەستی پێشمەرگە بوو، ئەمەش وای کرد کە پێشمەرگە بکشێتەوە تا هێڵی شین کە بۆ ساڵی پێش ٢٠٠٣ دەگەرێتەوە، کە نزیکەی (١٥) چاڵی بیری نەوتیان کۆنترۆڵ کرد.

ئەو هێزانەی کە بەکارهاتبوو پێکهاتبوو لە سوپا و پۆلیس و

هەر لەو پێودانگەوە لە ١٤-١٥ی ئاداری ٢٠١٨ کۆمەڵێك هێزی چەکدار لەسەر ڕێگای داقوقق - بەغدا هێرشیان کردووەتە سەر خەڵکی و ١٥ کەسیان کوشتووە و بریندار کردووە و ئۆتۆمبێلیان سووتاندووە کە هەموو سەرچاوەکان ئاماژە بە هێزێکی نەناسرا دەکەن کە لەو ناوچەیەدا بڵاوبوونەتەوە.

هەروەها سەرچاوە ئەمنییەکان ئەوە دەخەنە ڕوو کە ژمارەی ئەم چەکدارانە لەم شوێنە بە نزیکەی ١٠٠٠ کەس دەبێت.

* سەرچاوەکان:-
* جریدە المدی، ٤٠٧٦، ٢ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٠.
* ڕۆژنامەی (الصباح)، ژمارە ٤١٢٥ ڕۆژی پێنجشەمە ١٤ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠١٧.
* ڕۆژنامەی ئاژانس ژمارە ٦٩ لە ڕۆژی ٢٠ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠١٧، لاپەرە ٤.
* ڕۆژنامەی (المدی)، ژمارە (٤١٣٤) ڕۆژی ١٣ی شوبات ٢٠١٨ لاپەرە٢
* جریدە المدی ٤١٥٥ لە ١٤ی ئاداری ٢٠١٨ لاپەرە ٢.

# پێرست

ناوچەی کەرکوک ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاوی بینیووە بەهۆی گرنگی شوێنی جوگرافیو بوونی گوندەکانی لە ئاستی شارستانیو مرۆڤایەتی لە ماوەی چاخەکانی پێش مێژوو، لەو چاخە گرنگانەی مێژووی عێراق کە ناوچەکانی باکووری پێ دەناسرێتەوە، شوێنێکی بەرچاوو سەرەکی هەبووە بەهۆی بوونی ژینگەو ئاوو هەوایەکی سازگار. ناوچەی کەرکوک یەکێکە لەو ناوچانەی کە تایبەتە بە گرنگی ژینگەو ئاووهەواو سەرچاوەی ڕووەکیو ئاژەڵی گەورە، کە پاڵنەرێکی بەرچاو بوو بۆ نیشتەجێبوونی مرۆڤ لەو ناوچەیەدا، کەوتووەتە ناوچەیەکەوە لەنێوان بانی تەختو نیمچە چیایی تێدایە کە هاوسنوورە لە گەڵیدا، ناوچەیەکی هاوگونجاوە لەنێوان چیا بەرزەکان لە سەروو سەرووی ڕۆژهەڵاتو دەشتاییە نزمەکان لە خواروو کە بەرزییەکەی (٢٠٠) مەتر بۆ (١٠٠٠) مەترە، ڕێژەی (١٥٪)ی رووبەری عێراق پێک دەهێنێت.




دەزگای رۆشنبیریی جەمال عیرفان
لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسووڵ) چاپکراوە
2023